بسم الله الرحمن الرحيم

ناسنامه تفسیر

........................

- ناوی تفسیر: تفسیر ابن الکثیر بەکوردی
- وەرگێڕانی: علی حاجی عبدالله پریسی
- نۆرەی چاپ: یەکەم ٢٠١٢
- شوێنی چاپ: تاران
- هەڵەچنی و دیزاین: ابراهیم معروف

بڵاوکار:

ناوەندی رۆشنبیر بۆ چاپ و بڵاوکردنەوە

سلێمانی

بسم لله الرحمن الرحيم

## پێشەکی

الحمدلله رب العالمين والصلاة والسلام على عبد ورسوله محمد خاتم النبيين، و على أله ومحمد الفخرالعالمين، وعلى من تبعهم باحسان الى يوم الدين.

وبعد: ئەم قورئانە پیرۆزە بەرێزترین کتێبە کە خودای گەورە ئەم ئوممەتی ئیسلامەی پێ ڕێزدار کردوە.ئەم قورئانە پەڕاوێکی زۆر بەڕێزە هەرگیز پرپوپوچی تێکەڵاو نەبوە لەو کاتەوە هاتوەو لەمە بە دوایش تێکەڵاوی نابێ، لە لایەن کاریەجێی پایە بەرزەوە نێردراوە، وە ئەو قورئانە ڕێنیشاندەرە بۆ ئەوانەی بەرەو ڕاستی دەڕۆن.ئەوەی پابەند بێ بە قورئانەوە شارەزای ڕێی ڕاست کراوە،هەرکەسیش پشتی لێ هەڵکردبێ زیانێکی زۆر گەورەی کردوە.

ئومەتی ئیسلامی گرنگیەکی وایان داوە بە قورئان کە وێنەی نەبوە لە ناو هیچ گەلێکا لە پێشا، زانایانی ئەم ئوممەتە هەڵساون بە دیراسە کردنی قورئان لە هەموو ڕویەکەوە، لە بارەی فرمان و بڕیارو ماناو قسەی جوان و بەڵگەو نیشانەی زۆرو ڕەوان بێژی و پەندو ئامۆژگاری ڕودلو بەسەرهات و وتەی چاك و جوان هێمای وردو لایەنی ئیعجازو شێوازی شیکردنەوەو سەرو ژێر بۆ دانان و جیاوازی خوێندنەوەکان جۆری لەهجەکان و هەتا باسی لایەنی جوگرافی ئەو شوێن و وڵاتانەش کە لە قورئانی پیرۆزا ناویان هاتوە، وە لە چەند بارەی تریشەوە جگە لە مانە.

تەفسیری ئیبنو کەسیریش لە گرینگ ترینی ئەو نوسراوانەیە کە لە تەفسیری قورئانی پیرۆزا نوسرابێ. زۆرترو زیاتر پەسەند کراوەو بڵاوەی کردوە لە تەفسیرەکانی تر لەناو ئەم ئوممەتەدا.چونکە ئیبنو کەسیر زۆر شارەزا بوە بە زانستەکانی قورئان و فەرمودە وە بەزانستی پێشینەکان و ئەوانەی دوای ئەوانیش هاتون.

لەگەڵ ئەو وردبینیەی کە خوای گەورە پێی بەخشیبو لە سونەتی خۆی کە دێت بەسەر گەلاندا بۆ چاك بون و خراپ بون و پێشکەوتن و دزاکەوتن و تێکشکان و داڕوخانیان وە شارەزایەکی فراوانی هەبوە لە زانستەکاندا وە لە پێشەوە ئاماژەمان بۆ کرد لە بابەتەکاندا. ئیبنوکەسیر-ڕەحمەتی خوای لێبێ- ڕێگای تەفسیری مەئسوری هەڵبژاردو فەرمودەی مەرفوعی زۆر هێناوە لەگەڵ پیاو چاکانی پێشین لە هاوەڵانی پێغەمبەر(ﷺ) وشوێن کەوتوانی دوای ئەوان لە پێشەوایانی ڕێی ڕاست و دڵنیاو خاوەنباوەڕ. وە یەکێك بوە لەو کەسانەی کە

دەستێکی باڵای هەبووە لە زانستی ماناو تەفسیری قورئاناو بێ ئاگا نەبوە لە زانستەکانی تریش وەك باسمان کرد.بۆیە تەفسیرەکەی هونەری ڕیوایەت و پەی پێ بردن، تێدا کۆکردوەتەوەو مسوڵمانان سودێکی ئێجگار زۆریان لێوەرگرتوە.ڕەواج و داواکاریەکی زۆری لەسەر هەبوە کە بۆ هیچ پەڕاوێکی تری تەفسیر نەبوە مەگەر بەدەگمەن.

وە لێرەدا برای بەڕێزمان عبدالملکی موجاهد کە بەڕێوەبەرو بەرپرسی کتێبخانەی -دار السلام-ە خاوەنی توانای گەورەو مەبەستی بەرزو نیەتی باش و ئیشی چاکە بۆ هەڵسان بە ڕازەی کتێبی پێشینەکان لە شکڵێکی ناسك و بەرگێکی ڕازاوەدا توانی-دوای گفتوگۆو بیرو ڕا گۆڕینەوە- کۆمەڵێ خاوەن توانا دەست نیشان بکات لە مامۆستای خاوەن تواناو نوسەرو لێکۆڵەرەوەکان بۆ وەرگێڕانی ئەم تەفسیرە بۆ زمانە مەزنەکانی جیهان بە زیندویی و تەڕی.هەتا زۆرینەی زانایان سودی لێوەرگرن لە هەمو جیهانا.وای بەچاك زانی کە ئەم تەفسیرە کورت بکرێتەوە بۆ ئەوەی قەبارەکەی کەم بێتەوەو باسەکانیش بمێنێتەوەو لەناو نەچێ،وە فەرمودەکان و ئەو قسەو ڕاو بۆ چونانەی تریش کورت بکرێنەوەو بگەڕێنرێتەوە بۆ لای ئەو کەسانەی کە دەریان هێناوە هەتا کەڵکی تەواوی لێوەر بگیرێ. بۆ ئەم مەبەستە داوای لە مامۆستای بەڕێز ئەبونەلئەشبال ئەحمەد شاغف (خوا بیپارێزێ و تەمەن درێژی بکات) کرد کە بەم کارە هەڵسێ. ئەمیش هەمو توانای خۆی بەکار هێنا بۆ ئەم کورت کردنەوەیە ئەمەیش بە هێشتنەوەی چەند فەرمودەیەك لە یەك باسداکەمانای باسەکە بگەیەنێ و تەواوی بکا. فەرمودەکانی تری لابردوەو سڕییەوە کە تەنها دوبارە کردنەوەی یەك مانا بو لە چەند ڕێگای جیاجیاوە.وە هەر بەو شێوەیە قسەکانی زانایانی تەفسیریشی کورت کردەوە.وە هەندێ برای ڕاسپارد کە تەخریجی فەرمودەکان و قسەکان بکەن لە ژێر چاودێری خۆیداو بە پێی توانا پێی هەڵسا.بەڵام ڕونکردنەوەی ماناکان کە ئیبنو کەسیر کردبوی وەك خۆی هێشتیەوە لەگەڵدانانی ناونیشانەکان لەسەر باسەکان.

پاشان برای بەڕێز عبدالملیك موجاهید پیاچونەوەو چاوپیاخشاندنەوەی ئەم تەفسیرەی خستە ئەستۆی من،منیش هەڵسام بەو کارەو دەستم کرد بە گۆڕین و لابردن و کەم و زیاد کردن و چاك کردنی هەرکاتێ بە پێویستم زانیبێ،وە برای بەڕێزیش شەکیل ئەحمەد سەلەفی کە یەکێکە لە لێکۆڵەرەوەکانی بەش لێکۆڵینەوەو ڕاستکردنەوە لە داروسەلامابە هەنێ لەو کارانە

هەڵسا.بەمانەوە هەمو ئەم کتێبە تەواو کراو چاوی بینەرانی پێ ڕون و درەوشاوە دەبێ و دڵیان خۆش دەبێ،سوپاس بۆ خودا.

هەندێ لە کارەکانی تر:

١-ئەم پوختەیە لەیەك ڕونوسی چاپکراودا لە کتێبخانەی داروسەلام هاتوە.کەڕاست کراوەو جێی متمانەیە لەسەر ڕەنوسێکی کۆنی چاپکراوِ لە(دار أحیا الکتب العربیه،عیسی البابی المحلین وشرکاه)مێژوی ئەم چاپکردنە دیاری نەکراوە ،بەلآم وا دیارە چاپەکەی دەگەڕێتەوە بۆ چەرخێ لەمەو پێش، وە ئەم ڕونوسەی کە لە دارو سەلام چاپکراوە بەراورد کراوە لەگەڵ پێنج ڕونوسی ترا کە لێی کۆڵراوەتەوەو تازە چاپکراوەو بەپێی توانا هەڵەکانی ڕاست کراوەتەوە، ئەمەش لەلایەن خاوەنە ڕێزە لێکۆڵەرەوەکانەوە لە کتێبخانەی داروسلام.

٢-لە پەسەندیەکانی ئەم ڕونوسە کە ڕەچاو کراوە لەم کوت کردنەوەدا، ئەو هەلآنەی کە هەبوە لەناوی پیاوەکاندا ڕاستکراوەتەوە بە پیاچونەوەی-الاصول من کتب الرجال-پاشان ئەو ڕاستکردنەوەیە خراوەتە نێوان دوو کەوانە، وە هەر کاتێ شتێ بینرا ڕون نیە لە پەراوێزا ئاماژەی بۆ کراوە.

٣-ئەو ئایەتانەی قورئانیش کە لەکاتی تەفسیرەکەیدا هاتوە بە شێوەی نوسینی قورئانەکە لە نێوان ئەو کەوانەی کە تایبەتە بە ئایەتەکانی ئەو قورئانەوە دانراوە﴿ ﴾ لەو قورئانە وەرگیراوە کە بڕیاری لەسەر دراوە.

٤-لەسەری لاپەڕەکەوە ناوی سورەتەکەو ژمارەکەی و ژمارەی ئایەتەکان دانراوە بۆ بەئاسان گەیشتن بە مەبەست.

٥-وە لە کاتی جیاوازی ڕونوسەکان لە نوسینی ناوی سورەتەکاندا ئەو ناوە دەست نیشان کراوە کە لە سەرچاوەکەدا-ئەسڵەکەدا-هاتوە.

٦-زیادەکانم لەسەر ڕونوسی سەر چاوەکە داناوە لە نێوان دوو کەوانەدا ( ) ئەم کارانەش برایانی بەڕێز کە لە بەشی لێکۆڵینەوەو ڕاستکردنەوە لەو کتێبخانە کار دەکەن پێی هەڵساون خودا پاداشتی چاکەیان بداتەوە.کتێبخانەکە وای بەلاوە چاك بو کە ئەم پوختەیە لەیەك بەرگداو بە ئەندازەیەکی گونجاوو نرخێکی کەمدا بێت.بۆ ئەوی بە سوك و ئاسانی بگاتە هەمو شوێنێ.

هیچ ماڵێ لە ماڵی مسوڵمانان نەمێنێ ئەم کتێبە پیرۆزەی پێنەگات بە ئیزنی خودای گەورە. ببێتە توێشویەکی بە چێژ لە گەشتەکانیانداو توێشویەکی چاکیش بێ لە هات و چۆیاندا. بەڵکو خودا ئەوە بکا، هەرخۆشی یارمەتی دەرە بۆ چاکەو ڕێ نیشاندەرە بۆ ڕێی ڕاست.

وصل الله على خير خلقه محمد وعلى آله و صحبه و بارك وسلم.

صفی الرحمن المباركفوری

١٤٢٠/٦/١٢ هـ

# پێشەکی چاپی دووەم

سوپاس بۆ پەروەردگاری جیهان درودو ستایش بۆ عەبدو پێغەبەری خودا موحەمەد(ﷺ) کە بەرێزترین و دوایین پێغەمبەرەو لەسەر ئال و بەیت و هاوەڵەکانی وە هەرکەسێ ڕێڕەوی ئەو دەگرێتە بەرو لەسەر ڕێبازی ئەو بەردەوام تا ڕۆژی قیامەت. وبعد.

ئەمەچاپی دووهەم تەفسیری المصباح المنیر فی تهذیب إبنی کثیرة. کە مەکتەبەی دارالسلام للنشر والتوزیعە لە ریاز. کەچاپی یەکەمی ئەم تەفسیرە لەماوەیەکی زۆرکەمدا تەواوبوو، زانایان زۆر بە دڵیان بوو بە پەرۆشەوە ڕویان تێکرد، ئێمەش سوپاسی خودامان لەسەر کرد لەسەر ئەو چاکە زۆرەو مەزنەی .

بەبۆنەی ئەم چاپی دووهەمەوە، بەرپرسان هەڵسان بەهەندێ کاربەپێی ڕاوێژکردن بە زانایان و پسپۆڕو شارەزایان جگە لەوەی کە لە چاپی یەکەمدا باسی لێوە کرا،لیژنەیەکی لێکۆڵینەوە و ئامادەکاری زانستی کرایە بەرپرس کە هەڵسێت بەوە،کارەکانیشمان بریتیە لەم خاڵانە:

١-دەرهێنانی هەموو ئەو فەرمودە مەرفوعە لاوازانە کە لاوازییەکەیان ڕاست نەدەبووەو نەدەگەیشتە پلەی وەرگرتن سوپاس بۆ خودا لەم چاپەدا هەر فەرمودەیی سەحیح و حەسەن نەبێ ولاوازێ کە لاوازیەکەی ڕاست کراوەتەوەو بەرەو پلەی قبوڵ بەرز بوەتەوە نەهێنراوە،ئەم برا پسپۆڕانە پیاچونەوەیانکردوە بۆ لێکۆڵینەوە بۆ ئەم مەبەستە لەسەر قسەی پێشەواو زانایان دەربارەی ئەو فەرمودانە یان ئەو کەسانەی کە ڕیوایەتیان کردوە تا گەیشتونەتە نەتیجەی کۆتای بۆ دانانی پلەکانی ئەوفەرمودانە، لەفەرمودەی لاوازو حەسەن وسەحیح لاوازەکانیان دەرهێناوەو کاریان پێنەکردوە، ئەوانی کەیان هێشتۆتەوە،خودای گەورە پاداشتیان بداتەوە لەسەر ئەو هەوڵەیان کە جێی ڕێزە بە چاکی.

٢-ڕێکخستنی ئەو فەرمودە مەرفوعانە،دانانی سەرو ژێرو بۆر لەسەر وتەکانی پێغەمبەر(ﷺ) تا گومان پەیدا نەبێ لە هەندێ شوێنی گران و نارەحەتدا لەسەر زۆرینەی خوێنەران و مانا ڕاستەکان ڕوون و ئاشکرابێ. وەبەئاسانی خوێنەران وتەکانی پێغەمبەر(ﷺ) دەخوێننەوە بە شێوەیەکی ڕاست و ڕەوان.

وصلی الله علی خیر خلقه محمد(ﷺ) وعلی أله وصحبه وسلم.

صفی الرحمن المبارکفوری - ١٤٢١/٢/٤ هـ

## ڕاڤەی ئەو هێمایانەی کە بەکار هاتون لەم تەخریجەدا

إبن أبی حاتم - تفسير ابن أبی حاتم

إبن ابی حاتم - تفسير ابن أبی حاتم تحقيق دكتور الغامدی مسودة غير مطبوع

إبن أبی شيبة - المعنف لابن أبی شيبة

إبن حبان - صحيح ابن حبان

إبن خزيمة - صحيح ابن خزيمة

إبن عدی - الكامل فی ضعفاء الرجال لابن عدی

إبن عساكر - تاريخ دمشق لابن عسكار (مختصر)

إبن ماجة - سنن للإمام ابن ماجة القزوينی

إبن هشام - سيرة ابن هشام

أبو داوه - سنن اللامام أبی داود

أحمد - مسند اللامام أحمد بن حنبل

الاحياء - إحيا العلوم للامام الغزالی

الام - كتاب الام للامام الشافعی

البخاری - صحيح للامام البخاری

البخوی - تفسيرللامام البخوی

البيهقی - السنن الكبرای للامام البيهقی

تحفة الاحوذی - شرح جامع الترمذی لعبدالرحمان المباركفوری

التاريخ الكبير - للامام البخاری

الترمذی - جامع الترمذی

الحكم - مستدرك للحاكم

الحلية - حلية الاولياء لابی نعيم

الحميدی - مسند الحميدی

الخطيب - التاريخ للخطيب البغدادی

الدارقطنی - سنن للامام الدارقطنی

الدارمی - سنن الدارمی

الرازى - تفسير كبير للامام فخرالدين الرازى

الزفاف - أداب الزفاف لناصردين الألبانى

سعيد بن منصور - سنن سعيد بن منصور

السنة - كتاب السنة لابن أبى عاصم

شرح السنة - شرح السنة للامام البغوى

الشريعة - لمحمد بن المحسين الأجرى

الطبرانى - المعجم الكبير للطبرانى

الطبرى - تفسير جامع البيان للطبرى

عبدالرزاق - تفسير عبدالرزاق

العظمة - العظمة لأبى الشيخ دار العاصمة الرياض

العقيلى - الضعفا الكبير للعقيلى

علل المدين - لعلى بن المدينى

عمدة التفسير - عمدة التفسير عن الحافظ ابن كثير (أحمد شاكر)

غريب الحديث - غريب الحديث لأبى عبيد القاسم

فتح البارى - فتح البارى شرح صحيح البخارى ،لابن حجر

قرطبى - تفسير الجامع لأحكام القرأن للقرطبى

الكشاف - تفسير الكشاف للزمنحشرى

كنز - كنز العمال

المجمع - مجمع الزوائد

المحرر الوجيز - المحرر الوجيز فى تفسير الكتان العزيز لعبد الحق بن غالب الغزناطى

المحلى - المحلى لابن حزم

مسلم - صحيح للامام مسلم

مشكاة - مشكاة المصباح للخطيب التبريزى

مشكل - مشكل الأثار للطحاوى

المطالب - المطالب العالية بزوائد المسانيد الثمانية لابن حجر

موارد الضمأن - موارد الضمأن لأبى بكر الهيثمى

## ژیاننامەی دانەر (ئیبنو کەسیر)

### بە پێنوسی مامۆستای بەڕێز عەبدو القادر ئەرنائوت (خوا بیپارێزێ)

ئەم پێشەوا بەرێزە ناوی ئەبولفیداو عیمادەدینی ئیسماعیلی کوڕی عومەری کوڕی کەسیری قورەیشی بوسەیری ڕەچەڵەکەو لە دیمەشق فێری پەروەردەو زانست بوە .

لە مەجدەل لەدایك بوە کە دێیەکە سەر بەشاری بوسرایە لە ساڵی ٧٠١ کۆچی، باوکی وتار خوێنی دێهات بوە، لە تەمەنی چوار ساڵیدا باوکی کۆچی دوایی کردوە، براکەی پەروەردەی کردوە کەناوی مامۆستا عبدولوەهاب بوە، لەسەرەتای ژیانیەوە ئەو فێری زانیاری کردوە، پاشان ڕۆشتوە بۆ دیمەشق لەساڵی٧٠٦ کۆچیدا لەتەمەنی پێنج ساڵیدا.

### مامۆستاکانی

.فێری زانستە ئاینیەکان بوە لەلای مامۆستا بورهانەدینی کوڕی عبدڕەحمانی فەزاری بەناویانگ بە ئیبنو فەرکاح کە لەساڵی ٧٢٩ کۆچیدا کۆچی دوایی کردوە.وەگوێی گرتوە لە عیسای کوڕی موتعیم لە دیمەشق،وەلە ئەحمەدی کوڕی ئەبو تالیب بەناوبانگ بە ئیبنو شەحنە لەساڵی ٧٣٠ کۆچی کۆچی دوایی کردوە.وەلە حەجارکە لەساڵی٧٣٠ کۆچی دوایی کردوە. وە لە ئیبنو شیرازی وە لەئیسحاقی کوڕی یەحیای ئامێدی مامۆستای زاهیریەکان کە ناوی عەفیفە دینە. لەساڵی ٧٢٥ کۆچی،کۆچی دوایی کردوە، وە لەموحەمەدی کوڕی زەڕڕادیش. وەلەگەڵ مامۆستا جەمالەدینیشا بوەکە ناوی یوسفی کوڕی زەکی مەزییەکە لەساڵی٧٤٢ کۆچی،کۆچی دوایی کردوە.سودی زۆری لێوەرگرتوەو دەرچوەو کچەکەی هێناوەبوە بەهاوسەری کچەکەی وە خوێندویەتەوە بۆ شێخ الاسلام تەقیەدینی ئەحمەدی کوڕی عەبولحەلیمی کوڕی عەبدوسەلامی کوڕی ئیبنو تەیمیە کە لەساڵی ٧٢٨ کۆچی،کۆچی دوایی کردوەوە خوێندوشییەتیەوە بۆ مامۆستای شارەزاو مێژو نوس شەمسەدین موحەمەدی کوڕی ئەحمەدی کوڕی عوسمانی کوڕی قایمازی زەهەبی کە لە ساڵی ٧٤٨ کۆچی، کۆچی دوایی کردوە.وە ئەبو موسای قەرافی و ئەبو فەتحی دەبوسی و علی کوڕی عومەری سورانی و کەسانی تریش ئیجازەیان پێداوە لە میسر.حافیزی زەهەبی لە کتێبی(المجم المختص)دا لەبارەی ئیبنو کەسیرەوە وتویەتی:ئیبنو کەسیر پێشەواو موفتی بوە فەرمودە زانێکی زۆر شارەزا بوە،ئاین زانێکی پڕ هونەر بوە،تەفسیر زانێکی زوو گوێزەرەوە بوە دانراوی بەسودی هەیە.ئیبنو حەجەری ئەسقەلانی لە کتێبی الدررالکافة دا وتویەتی:ئیبنو کەسیر سەرقاڵی فەرمودە بوە، بەخوێندنەوەی دەقەکانی و

پیاوەکانیەوەو زۆر خۆی ئامادە کردوە قسە خۆشیش بوە، لە ژیانی خۆیدا دانراوەکانی کتێبەکانی ڕۆشتوەو بلاو بۆتەوە، خەڵکی دوای مردنی سودیان لێوەرگرتوە.

مێژونوسی بەناوبانگ ئەبولمحاسن جمالەدین یوسفی کوڕی سەیفەدین کەناسراوە بە ئیبن تەغری بەردی لە کتێبیالمنهل الصافی والموستوفی بعدالوافی وتویەتی:ئەو مامۆستاو پێشەواو زۆر زانایە عمادەدینی ئەبو لفیدا واتە ئیبنو کەسیربەردەوام خەریك بوە،خۆی ماندو کردوەوزانستی بەدەست هێناوەو نوسیویەتی لە فیقە و تەفسیرو فەرمودەدا دەستێکی باڵای هەبوە، کۆی کردوەتەوە دای ناوە، دەرسی گوتوەتەوەو فەرمودەی ڕاڤە کردوەو کتێبی داناوە.شارەزاییەکی مەزنی هەبوە لە فەردمودەو تەفسیرو فیقهو زمانی عەرەبی و بواری تریشا.فەتوای داوەو دەرسی وتوەتەوە هەتا کۆچی دوایی کردوە ڕەحمەتی خوای لێبێ بەناوبانگ بوە لە ڕێکخستن و نوسیندا ،سەرکردایەتی زانستی لە مێژو فەرمودەو تەفسیردا گرتوەتە دەست.

## فێرخوازەکانی

فێرخوازەکانی زۆرن لەوانە ئیبنو حیجی کە لەبارەی ئیبنو کەسیرەوە وتویەتی: چاکترین لەبەرکەر بوە بۆ دەقی فەرمودەکان کە پێی گەیشتبین و شارەزاترین کەسیش بوە لە شەرحی فەرمودەو پیاوەکانی و دروست و نادروستەکانی، مامۆستاو نزیکەکانی شایەتیان بۆ داوەلەو بارەیەوە.نازانم من هەر کاتێك لەلای دانیشتبم مەگین سودم لێوەرگرتوە.ئیبنو عیمادی حەنبەلی لەکتێبەکەیدا شذرات الذب فی أخبار من ذهب ئەلێت: حافیزی مەزن عیمادەدین واتە ئیبنو کەسیر زۆری لەبەر دەکردو کەمی لەبیر دەچوەوە،شارەزایی باش بو، لەزمانی عەرەبیدا هاوکاری دەکرد.ئیبنو حەبیب لە بارەیەوە وتویەتی: گوێی گرتوەو کۆی کردوەتەوەو کتێبی داناوە: زۆر ئارەزو مەندی بیستنی فەتوا بوە، فەرمودەی گێڕاوەتەوەو سودی لێوەرگیراوە، پەڕەی فەتواکانی لە ولاتا بلاوەی کردبو،بەناوبانگ بوە لە ڕێکخستن و نوسیندا.

## دانراوەکانی

١-لەوانە کە لەنایاب ترین کتێبیان بوە تەفسیری قورئانی پیرۆزە، کەلەچاك ترین کتێبی تەفسیرە لە گێڕانەوەدا. چەند جار لەچاپ دراوەو چەند جایش کورت کراوەتەوە.

٢-مێژوکە ناوبراوەبە (البدایة) کەچاپ کراوە لە (١٤) بەرگدا. بەناوی (البدایە والنهایە) کە بەسەرهات و چیرۆکی پێغەمبەران وگەلانی پێشینەو ژیانی پێغەمبەرو(ﷺ) مێژوی ئیسلامی

تا سەردەمی خۆی تیا باس کردوە، پاشان کتێبی (الفتن وأشراط الساعة والملاحم وأحوال الأخرة)ی دانا. کەمەبەست پێی (النهایە)یە، لە پێشدا البدایە چاپکراو پاشان النهایە خۆی بەتەنیا چاپکراو چەند کەس توێژینەوەیان تێدا کردوە.

٣-(التکمیل فی معرفة الثقات والضعفاء والمجاهیل) کە هەردو کتێبی مامۆستای مەززی و زەهەبی تیا کۆکردبوەوە کە ناویان (تهذیب الکامل فی أسماء الرجال و میزان الاعتدال فی نقد الرجال)ە لەگەڵ زیادکردنی بە سوددا لەبارەی جەرح و تەعدیلەوە.

٤-(التهدی والسنن فی أحادیث المسانید والسنن) کەبەناوبانگە بە (جامع المسانید) کە موسنەدی ئیمام ئەحمەدو بەزازو ئەبو یەعلای موسڵی و ئیبنو ئەبی شەیبەی تیا کۆکراوەتەوە لەگەڵ هەر شەش سەحیحەکەدا بەخاری و موسلیم و نەسائی و ئیبنو ماجە و ترمیزی و ئەبو داود ڕێکیشی خستوە بە چەند بەشێك، هەندێکی تازە لێچاپکراوە.

٥-(طبقات الشافعیة) بەرگێکی مام ناوەندیە، بەسەرهات و ژیانی شافعیشی لەگەڵدایە .

٦-فەرمودەکانی (أدلة التنبیة) تەخریج کردوە لە فیقهی شافعیدا.

٧-هەڵساوە بە ڕاڤەکردنی سەحیحی بوخاری بەڵام تەواوی نەکردوە.

٨-دەستی کردوە بەدانانی کتێبێکی گەورە لە ئەحکامەکاندا ئەمیش تەواو نەکراوە تا حەج ڕۆشتوە تێیدا.

٩-کورتەی کتێبی (المدخل للبیهقی).

١٠-زانستەکانی فەرمودەی ئەبو عومەری سەلامی کورت کردوەتەوەو ناوی ناوە علوم الحدیث مامۆستا ئەحمەد شاکیر کە زانایەکی فەرمودەی میسریە ڕەحمەتی خودای لێبێ چاپیکردوە لەگەڵ ڕاڤەیەکدا بۆی. ڕاڤەکەی ناوناوە (الباحث الحثیث فی شرح مختصر علوم الحدیث) چەند جار ئەم کتێبە چاپکراوە.

١١-ژیانی پێغەمبەر(ﷺ) بەدرێژی و بەکورتکراوەیی لەناو کتێبی البدایەدا، کە هەردوکیان چاپکراوە.

١٢-نامیلکەیەك لەبارەی جیهادەوە ناوی ناوە (الاجتهاد فی طلب الجهاد) چەند جارێ لەچاپ دراوە.

## کۆچی دوایی

ئیبنو حەجەری عەسقەلانی ڕەحمەتی خوای لێ بێ ئەڵێت: ئیبنو کەسیر لە کۆتایی ژیانیا چاوەکانی لەدەست داوە لە دیمەشق الشام المحروسه کۆچی دوایی کردوە لەساڵی٧٧٤ کۆچیدا خودای مەزن بەزەیی بێتەوە پێیدابە بەزەییە فراوانەکەی خۆیی و لە بەهەشتە پان و بەرینەکەیدا نیشتەجێی کات.

## پێشەکی ئیبنو کەسیر

پێشەواو کەم وێنەو شارەزاو پارێزگارو خواناس عیمادەدین ابو لفیدا:ئیسماعیل کوڕی خەتیب ئەبو حەفەس کوڕی عومەری کوڕی کەسیری شافعی –بەر ڕەحمەتی خوای کەوێ و لێی ڕازی بێ– وتی: سوپاس بۆئەوخودای کە کتێبەکەی بە ستایش دەست پێکردوەو فەرمویەتی ﴿ٱلْحَمْدُ لِلَّهِ رَبِّ ٱلْعَٰلَمِينَ ﴿٢﴾ ٱلرَّحْمَٰنِ ٱلرَّحِيمِ ﴿٣﴾ مَٰلِكِ يَوْمِ ٱلدِّينِ﴾ سوپاس بۆ خودا کە ڕامێنەری جیهانە، جەهەندەو دلۆڤانە، خاوەنی ڕۆژی قیامەتە. وە بونەوەری بە ستایش دەست پێکردوەو ئەفەرموێت: ﴿ٱلْحَمْدُ لِلَّهِ ٱلَّذِى خَلَقَ ٱلسَّمَٰوَٰتِ وَٱلْأَرْضَ وَجَعَلَ ٱلظُّلُمَٰتِ وَٱلنُّورَ ثُمَّ ٱلَّذِينَ كَفَرُوا۟ بِرَبِّهِمْ يَعْدِلُونَ﴾[1] سوپاس و ستایش بۆ خودا بێت کە ئاسمانان و زەمینی وەدی هێناوە و تاریکای و ڕوناکیش ئەو دروستی کردوە،ئەو کەسانەش کە حاشایان لە پەروەرندەیان هەیە،دێن لە پاشان شەریمی بۆ پەیدا دەکەن.وە کۆتایشی هەر بە سوپاس و شتایش هێناوە دوای ئەوەی باسی ئاکامی خەڵکی بەهەشت و خەڵکی جەهەنەمی کردوە و ئەفەرموێت:﴿ وَتَرَى ٱلْمَلَٰٓئِكَةَ حَآفِّينَ مِنْ حَوْلِ ٱلْعَرْشِ يُسَبِّحُونَ بِحَمْدِ رَبِّهِمْ ۖ وَقُضِىَ بَيْنَهُم بِٱلْحَقِّ وَقِيلَ ٱلْحَمْدُ لِلَّهِ رَبِّ ٱلْعَٰلَمِينَ﴾[2] فریشتەکانیش دەبینی، دەوری تەختیان داوە، تەسبیحات دەکەن بە ستایشی پەروەردگاریان و لەنێویاندا بە هەق دادوەری کرا،دەڵێن سوپاس بۆ پەروەردگاری جیهان.بۆیە خودای گەورە ئەفەرموێت:﴿ وَهُوَ ٱللَّهُ لَآ إِلَٰهَ إِلَّا هُوَ ۖ لَهُ ٱلْحَمْدُ فِى ٱلْأُولَىٰ وَٱلْءَاخِرَةِ ۖ وَلَهُ ٱلْحُكْمُ وَإِلَيْهِ تُرْجَعُونَ ﴾[3] ئەو خودایەو جگە لەو هیچ پەرستراوێك نیە،لە دنیاش و لە قیامەتیش سوپاس هەر

---

[1] الأنعام ١.

[2] زمر٧٥.

[3] القصص ٣.

تایبەتی ئەوە،فەرمان هەر فەرمانی ئەوە و بۆلای ئەویش دەگەڕێتەوە .لەسەرەتاو لە دوایشدا سوپاس و ستایش هەر بۆ خودایە،واتە لەوەی کە وەدی هێنراوەو وەدی هێنەری خۆی نیە،هەر خودا لەسەر گشت دروستکراوەکانی هەمیشە ستایش دەکرێ،وەك نوێژ خوێن دەڵێ: (ئەی خودایە پەروەردگارمان سوپاس بۆ تۆ بە پڕی ئاسمانەکان بە پڕی زەمین وە بەپڕی ئەوەی تۆ ویستوتەو وە لە دوایشدا دەتەوێ)[1]. سوپاس بۆ ئەو خودایەکەپێغەمبەرەکانی ناردوە. ﴿ رُّسُلًا مُّبَشِّرِينَ وَمُنذِرِينَ لِئَلَّا يَكُونَ لِلنَّاسِ عَلَى اللَّهِ حُجَّةٌ بَعْدَ الرُّسُلِ وَكَانَ اللَّهُ عَزِيزًا ﴾[2] گشت پێغەمبەران مژدە دەرو ترسێنەر بون، تا لە پاش پێغەمبەران ئەو خەڵكە هیچ بەڵگەیەکیان لەلا نەبێ بۆ لای خوا.وە کۆتایی پێهێناون بەم پێغەمبەرەنەخوێندەوارە عەرەبەی خەڵکی مەککە کە ڕێ نیشاندەرە بۆ ئاشکرا ترین ڕێگا.ڕەوانەشی کردوە بۆ گشت دروستکراوەکانی لە مرۆڤ و جنۆکە لەو کاتەوە هاتوە تا قیامەت دێ،وەك خودای گەورە ئەفەرموێت: ﴿ قُلْ يَا أَيُّهَا النَّاسُ إِنِّي رَسُولُ اللَّهِ إِلَيْكُمْ جَمِيعًا الَّذِي لَهُ مُلْكُ السَّمَاوَاتِ وَالْأَرْضِ لَا إِلَٰهَ إِلَّا هُوَ يُحْيِي وَيُمِيتُ فَآمِنُوا بِاللَّهِ وَرَسُولِهِ النَّبِيِّ الْأُمِّيِّ الَّذِي يُؤْمِنُ بِاللَّهِ وَكَلِمَاتِهِ وَاتَّبِعُوهُ لَعَلَّكُمْ ﴾[3] بڵێ: خەڵکینە ! من خودای گەورە ڕای سپاردوم لای ئێوە هەموتان ئەوخودایەی موڵکایەتی ئاسمانەکان و زەمین هەر بۆ ئەوە ،لە خۆی بەدەر هیچ شت بۆ پەرستن نابێت،گیان دەبەخشێ و گیان دەستێنێ ،دەسا ئێوە بە خوداو بە پێغەمبەری نەخوێندەوار بڕوا بکەن،کە ئەویش خۆی باوەڕی بە خودا هەیە و بە هەرچی خودا گوتویە بڕوا دەکا،شوێنی کەون،بەڵکو شارەزای ڕێگە بن.وە ئەفەرموێت:﴿قُلْ أَيُّ شَيْءٍ أَكْبَرُ شَهَادَةً قُلِ اللَّهُ شَهِيدٌ بَيْنِي وَبَيْنَكُمْ وَأُوحِيَ إِلَيَّ هَٰذَا الْقُرْآنُ لِأُنذِرَكُم بِهِ وَمَن بَلَغَ أَئِنَّكُمْ لَتَشْهَدُونَ أَنَّ مَعَ اللَّهِ آلِهَةً أُخْرَىٰ قُل لَّا أَشْهَدُ قُلْ إِنَّمَا هُوَ إِلَٰهٌ وَاحِدٌ وَإِنَّنِي بَرِيءٌ مِّمَّا تُشْرِكُونَ ﴾[4] تابەهۆی ئەو -واتە قورئان- ترس وەبەرئێوە بنێم و هەرکەسیش کە پێی دەگا. هەرکەسێ ئەم قورئانەی پێگەیشت لە عەرەب لە عەجەم لە ڕەش لە سوورلە مرۆڤ و لە جنۆکە

---

[1] مسلم /١/٣٤٣ ص٩.

[2] النساء ١٦٥.

[3] الأعراف ١٥٨.

[4] الأنعام ١٩.

ئەوە ئاگادار کردنەوەیە بۆی،بۆیە خوای گەورە ئەفەرموێت: ﴿أَفَمَن كَانَ عَلَىٰ بَيِّنَةٍ مِّن رَّبِّهِۦ وَيَتْلُوهُ شَاهِدٌ مِّنْهُ وَمِن قَبْلِهِۦ كِتَٰبُ مُوسَىٰٓ إِمَامًا وَرَحْمَةً ۚ أُو۟لَٰٓئِكَ يُؤْمِنُونَ بِهِۦ ۚ وَمَن يَكْفُرْ بِهِۦ مِنَ ٱلْأَحْزَابِ فَٱلنَّارُ مَوْعِدُهُۥ ۚ فَلَا تَكُ فِى مِرْيَةٍ مِّنْهُ ۚ إِنَّهُ ٱلْحَقُّ مِن رَّبِّكَ وَلَٰكِنَّ أَكْثَرَ ٱلنَّاسِ لَا يُؤْمِنُونَ﴾[1] هەرکەسێکیش لەو کۆمەڵانە حاشای لێبکا جێی لە ئاگرا خۆش کراوە. هەرکەسێ بڕوای بەقورئان نەبێ لەوەی کە باسمان کرد جێگەی ناو ئاگرە بەم دەقەی کە خوا دەفەرموێت: ﴿فَذَرْنِى وَمَن يُكَذِّبُ بِهَٰذَا ٱلْحَدِيثِ ۖ سَنَسْتَدْرِجُهُم مِّنْ حَيْثُ لَا يَعْلَمُونَ﴾[2] تۆ من بێڵە بۆ ئەوانەی بەم قورئانە باوەڕ ناکەن، کەم کەم دەستیان بۆ شل دەکەم، کە هەرخۆیان هەستی پێنەکەن. وە پێغەمبەری خودا(ﷺ) فەرمویەتی: ڕەوانە کرام بۆ سورو ڕەش، موجاهید ئەڵێت:یانی مرۆڤ و جنۆکە[3]. پێغەمبەری خودا(ﷺ) نێردراوی خودایە بۆ سەر مرۆڤ و جنۆکە، تا ئەوەی لەلایەن خوداوە پێی ڕاگەیەنراوە پێیان بگەیەنێ لەم قورئان پیرۆزە کە﴿لَّا يَأْتِيهِ ٱلْبَٰطِلُ مِنۢ بَيْنِ يَدَيْهِ وَلَا مِنْ خَلْفِهِۦ ۖ تَنزِيلٌ مِّنْ حَكِيمٍ حَمِيدٍ﴾[4] پڕوپوچ لەڕوی ناوەستێ، چ ڕووبەڕو چ پاشە ملە ئەمە کارزانێنارد‌ویە کە هەردەبێ سوپاس بکرێ.

## هان دان بۆ تێگەیشتن لەم قورئانە

پێغەمبەری خودا(ﷺ) لەم قورئانەدا کە لەلای خواوە بۆی هاتوە ئاگاداری کردون کە خوا هانەیان ئەدا بۆ تێگەیشتن لەم قورئانە،خودای مەزن ئەفەرموێت: ﴿أَفَلَا يَتَدَبَّرُونَ ٱلْقُرْءَانَ ۚ وَلَوْ كَانَ مِنْ عِندِ غَيْرِ ٱللَّهِ لَوَجَدُوا۟ فِيهِ ٱخْتِلَٰفًا كَثِيرًا﴾[5] ئاخۆ ئەمانە لە قورئان ورد نابنەوە سەرنجی ڕانەکێشاون؟ ئەگەر قورئان کاری کەسێکی تر بوایە جگە لە خودا،دیارە مەبەستی ناڕێك و دژ بەیەکیان زۆر تێدا پەیدا دەبو.وە ئەفەرموێت:﴿كِتَٰبٌ أَنزَلْنَٰهُ إِلَيْكَ مُبَٰرَكٌ لِّيَدَّبَّرُوٓا۟ ءَايَٰتِهِۦ وَلِيَتَذَكَّرَ

---

[1] هود ١٧.

[2] قلم ٤٤.

[3] احمد /١٤٥/٥ ص٩.

[4] فصلت ٤٢.

[5] النساء ٨٢.

أُوْلُواْ ٱلْأَلْبَٰبِ ﴾[1] ئایا ئەوانە لەم قورئانە ڕانامێنن یان دڵیان داخراوە؟بۆیە پێویستە لەسەر زانایان مانای قورئان ڕوون بکەنەوەو تەفسیری بکەن و بگەڕێن بە شوێنیاو فێری ببن و خەڵکیش فێر بکەن وەك خودای گەورە ئەفەرموێت: ﴿وَإِذْ أَخَذَ ٱللَّهُ مِيثَٰقَ ٱلَّذِينَ أُوتُواْ ٱلْكِتَٰبَ لَتُبَيِّنُنَّهُۥ لِلنَّاسِ وَلَا تَكْتُمُونَهُۥ فَنَبَذُوهُ وَرَآءَ ظُهُورِهِمْ وَٱشْتَرَوْاْ بِهِۦ ثَمَنًا قَلِيلًا ۖ فَبِئْسَ مَا يَشْتَرُونَ ﴾[2] ئەوسا خودا بەڵێنی لەو کەسانە سەند کە کتێبیان بۆ هاتوە، بە مەرجومی ڕاگەیەنن و نەی شارنەوە،کەچی ئەوان لە پەیمان پاشگەز بونەوە و بەنرخێکی کەمیان فرۆشت، ئای کی کڕین و فرۆشێکی خراپیان کرد, وە ئەفەرموێت:﴿ إِنَّ ٱلَّذِينَ يَشْتَرُونَ بِعَهْدِ ٱللَّهِ وَأَيْمَٰنِهِمْ ثَمَنًا قَلِيلًا أُوْلَٰٓئِكَ لَا خَلَٰقَ لَهُمْ فِى ٱلْءَاخِرَةِ وَلَا يُكَلِّمُهُمُ ٱللَّهُ وَلَا يَنظُرُ إِلَيْهِمْ يَوْمَ ٱلْقِيَٰمَةِ وَلَا يُزَكِّيهِمْ وَلَهُمْ عَذَابٌ أَلِيمٌ ﴾[3] ئەوانەی پەیمانەکەیان لەگەڵ خوداو سوێندی خۆیان بە نرخێکی کەم دەفرۆشن، لەم دنیا هیچ بەشیان نییە و خوداش لە ڕۆژی قیامەتا نایان دوێنیٚ و نایان بینیٚ و لە گوناهیان پاك ناکاتەوە نابوریٚ و بەشیان سزای بە ژانە.خودای گەورە زەمی ئەهلی کتێب دەکات کە پێش خۆمان هاتن و خۆیان دورە پەرێز گرت لەو کتێبەی خودا کە بۆیان ڕەوانە کرا، ڕویان کردە ژیانی دنیا و کۆکردنەوەی ماڵی دنیا،لە جێی ئەوەی شوێن کتێبی خودا بکەون،خۆیان سەرقاڵ کرد بە شتێکەوە کە فەرمانیان پێنەدرابو بیکەن.

ئەی مسوڵمانان پێویستە لەسەرمان واز بهێنین لەو شتانەی کە خودا زەمی ئەوانی لەسەر کردوەو فەرمان بدەین بەوەی خودا فەرمانی پێداوین بە فێربونی ئەو کتێبەی خودای گەورە بۆی ناردوین لێی شارەزا بین مەردمیش فێرو شارەزا بکەین،خودای گەورە ئەفەرموێت: ﴿أَلَمْ يَأْنِ لِلَّذِينَ ءَامَنُوٓاْ أَن تَخْشَعَ قُلُوبُهُمْ لِذِكْرِ ٱللَّهِ وَمَا نَزَلَ مِنَ ٱلْحَقِّ وَلَا يَكُونُواْ كَٱلَّذِينَ أُوتُواْ ٱلْكِتَٰبَ مِن قَبْلُ فَطَالَ عَلَيْهِمُ ٱلْأَمَدُ فَقَسَتْ قُلُوبُهُمْ ۖ وَكَثِيرٌ مِّنْهُمْ فَٰسِقُونَ ﴿١٦﴾ ٱعْلَمُوٓاْ أَنَّ ٱللَّهَ يُحْىِ ٱلْأَرْضَ بَعْدَ مَوْتِهَا ۚ قَدْ بَيَّنَّا

---

[1] صاد ٢٩.

[2] ال عمران ١٨٧

[3] ال عمران ٧٧

لَكُمُ ٱلْأَيَٰتِ لَعَلَّكُمْ تَعْقِلُونَ ﴾[1] ئایە بۆ ئەو کەسانەی کە بڕوایان هێناوە،ئەو کاتە نەهاتوە کە دڵیان بۆ یادی خوداو بۆ ئەو ڕاستەی کە ناردویەتی ڕاچڵەکێنێ وبکورکێنێ و بەدەردی ئەوانە نەچێ کە لە پێشدا ئێمە کتێبمان دابوونێ و ئەوسا لەپاش ماوەیەکی زۆر تووشی دڵڕەقی هاتن و زۆربەیان لە ڕێ لایاندا ؟ئەوە بزانن کە خودایە زەمین زیندوو دەکاتەوە،پاش مردنی زۆر نیشانەی ئاشکرامان بۆ ئێوە ڕون کردوەتەوە،بەڵکو ئێوە تێبگەن.

خودای گەورە لەباسی ئەم ئایەتەدا کە لە دوای ئایاتی پێشەوە هاتووە ئاگاداری داوە کە خودا هەر چۆنێ زەوی زیندو دەکاتەوە پاش مردنی هەر بەو شێوەیەش دڵەکان نەرم دەکات بە باوەڕو شارەزایی دوای ڕەق بونی بە گوناه و سەرپێچیەکان. هیوادارین و داوامان وایە وایش لەگەڵ ئێمە بکات،بێگومان خودا زۆر بەخشندەو میهرەبانە.

### سەرچاوەکانی تەفسیر

ئەگەر کەسێ وتی:کام ڕێگای تەفسیرکردن چاکترە؟وەڵامەکەی چاکترین و ڕاسترین ڕێگا لە ڕێگاکانی تەفسیر ئەوەیە کە قورئان بە قورئان تەفسیر بکرێ،چونکە لەهەر شوێن بە کورتی هاتبێ لە شوێنێکی ترا بە ئاسانی و درێژکراوەیی هاتوە،خۆ ئەگەر شتێکت لێگیراونەتزانی بچۆ بۆ فەرمودەکانی پێغەمبەر(ﷺ) چونکە فەرمودەکانی پێغەمبەر(ﷺ) ڕاڤەیە بۆ قورئان و ڕونکەرەوەیەتی، خودای گەورە دەفەرموێت: ﴿ إِنَّآ أَنزَلْنَآ إِلَيْكَ ٱلْكِتَٰبَ بِٱلْحَقِّ لِتَحْكُمَ بَيْنَ ٱلنَّاسِ بِمَآ أَرَىٰكَ ٱللَّهُ ۚ وَلَا تَكُن لِّلْخَآئِنِينَ خَصِيمًا ﴾[2] ئەم قورئانەمان بۆلای تۆ ناردۆتە خوار، کەهەرچی تێدایە ڕاستە، مادام بەهۆی ئەم قورئانە وەك خودا ڕێی نیشان داوی تا بڕیار بدەی لە نێوان خەڵکیدا، خۆشت مەکە بە لاگیری گزیکاران، وە ئەفەرموێت: ﴿ وَمَآ أَنزَلْنَا عَلَيْكَ ٱلْكِتَٰبَ إِلَّا لِتُبَيِّنَ لَهُمُ ٱلَّذِى ٱخْتَلَفُوا۟ فِيهِ ۙ وَهُدًى وَرَحْمَةً لِّقَوْمٍ يُؤْمِنُونَ ﴾[3] هەر بۆیە ئەم کتێبەمان ناردوەتە سەر تۆ کە بەکێشەی نێوان ئەمانە ڕابگەی و ڕێنیشاندەرو بەزەیی بیت بۆ کەسانی خاوەنباوەڕ،وە ئەفەرموێت: ﴿ بِٱلْبَيِّنَٰتِ وَٱلزُّبُرِ ۗ وَأَنزَلْنَآ إِلَيْكَ ٱلذِّكْرَ لِتُبَيِّنَ لِلنَّاسِ مَا نُزِّلَ إِلَيْهِمْ

---

[1] الحديد ١٦-١٧

[2] النساء ١٠٥

[3] النحل ٦٤

﴿ وَلَعَلَّهُمْ يَتَفَكَّرُونَ ﴾[1] واتە: ئەم کتێبەمان بۆ تۆش نارد ،تا خەڵکی لێ تێبگەیەنی و بەڵکو بیر بکەنەوە.لەبەر ئەمەیە پێغەمبەری خودا(ﷺ) ئەفەرموێت: ئەوسا بزانن من قورئانم پێدراوەو ئەوەندەی تریش لەگەڵیدا[2]، یانی: فەرمودە فەرمودەیش دیسا بە نیگا هاتۆتە خوار بۆی وەك چۆن قورئان هاتۆتە خوار بۆی،بەڵام وەك قورئان دەخوێنرێتەوە،فەرمودە وا ناخوێنرێتەوە. مەبەست ئەوەیە تۆ تەفسیری قەرئان وەدەست دێنی.لە قورئان خۆیدا، ئەگەر دەستت نەکەوت لە فەرمودە، خۆ ئەگەر لە قورئان و فەرمودە دەستمان نەکەوتدەگەڕێینەوە بۆ قسەی هاوەڵەکانی پێغەمبەر(ﷺ) بێگومان ئەوان شارەزایان زیاترە لەو بارەیەوە،بەهۆی ئەو بارودۆخ و شتانەی پەیوەست بوەبە خۆیانەوە،چونکە.ئەوان شارەزاییەکی باش و زانیاریەکی تەواو ئاکارێکی چاکیان هەبوە، بەتایەبەتی پیاوە زاناو مەزنەکانیان وەك چوار پێشەوا بەڕێزە ڕێ نیشاندراوە ڕێ نیشاندەرەکان ئەبو بەکرو عمروعوسان وعلی ڕەزای خوایان لێبێت، وە عەبدڵای کوڕی مەسعود ڕەزای خوای لێبێ، ئیمام ئەبو جەعفەری کوڕی جەریر ڕیوایەتی کردوە لە عەبدڵای کوڕی مەسعودەوە واتە: لە قورئان نەهاتۆتە خوار مەگەر من دەزانم لەبارەی چییەوەو لەکوێ هاتۆتە خوار،خۆ ئەگەر بزانم کەسێ زاناترە بە کتێبی خودا لە من و سواری وڵاخ دەیگاتێ خۆم دەگەیانێ[3].

یەکێتر لەوانە زاناو زۆر شارەزا عبداللەی کوڕی عباس ئامۆزای پێغەمبەری خودا(ﷺ) وەرگێڕو تەفسیرزانی قورئان بەهۆی بەرەکەتی دوعای پێغەمبەری خودا(ﷺ)کە فەرمویەتی: ئەی خودایە ! شارەزای کە لە ئایندا و فێری تەفسیریشی بکە[4]، ئیبنو جەریر ڕیوایەتێ کردوە لە عەبداللەی کوڕی مەسعودەوە ئەڵێت :چاکترین وەرگێڕی قورئان ئیبنوعباسە[5]. ئەم سەنەدانەش ڕاستن، ئیبنو مەسعود ڕەزای خودای لێبێ لەساڵی ٣٢ ی کۆچیدا کۆچی دوایی کرد بە پێی سەرچاوە ڕاستەکان، دوای ئەو عبداللەی کوڕی عباس ٣٦ ساڵ ژیاوە، ڕات چیە بەو زانیارانەی دوای ئیبنو مەسعود بەدەستی هێناوە. ئەعمەش وتی لە ئەبو وائیلەوە: ئیمامی عەلی لەکاتی

---

[1] نحل ٤٤

[2] ئەحمەد /١٣١/٤/فەرمودەیەکی سەحیحە

[3] الطبري/١/٨٠

[4] فتح الباري١/٢٠٥

[5] الطبری/١/٩٠

حەجدا عەبداللەی كوڕی عباسی دانا، عەبدالله وتاری بۆ خەڵكی ئەدا لە وتارەكەیدا سەرەتای بەقەرەی خوێند، لە ڕیوایەتێكی تردا هاتوە، سورەتی نوری خوێند، بەشێوەیەك تەفسیری كرد ئەگەرڕۆم و تورك و دلیەم گوێیان لێی بوایە مسوڵمان دەبون[1].

هەربۆیە زۆربەی ئەو شتانەی كە ئیسمائیلی كوڕی عبالرحمان یانی سودی ڕیوایەتی كردوە لە تەفسیرەكەیدا لەم دوو پیاوەوە ئیبنو مەسعود و ئیبنو عباسەوەیە، بەڵام هەنێ جار ئەو قسانەی لە ئەهلی كتێبەوە گێڕاویانەتەوە لێی وەرگرتوون كە پێغەمبەری خودا(ﷺ) ڕێی پێدابون كە ئەفەرموێت: با ئایەتێكیش بێت لە منەوە هەر بیگەیەنن، لەبارەی نەوەی ئیسرائیلەوە قسە بگێڕنەوە قەدەغە نییە،هەركەسێ درۆ بەدەمی منەوە بكات بە ئەنقەست بایشتگەی -جێ قنكی- خۆی ئامادە بكات لەناو ئاگردا[2]، بوخاری ڕیوایەتی كردوە لە عەبدواللەی كوڕی عومەرەوە.

### حوكمی ڕیوایەتە ئیسرائیلیەكان

ئەم فەرمودە ئیسرائیلیان بۆ بەڵگە هێنانەوە باس دەكرێ نەك بۆ پشتگیری كردنیان وە ئەمانە دەكرێن بە سێ بەشەوە یەكەمیان: ئەوی كە زانیمان كە ڕاستەو ئەو شتانەی كە لەبەر دەستمان دایە شایەتی ڕاستی بۆ ئەدەن، ئەوە دروست و تەواوە، دووەمیان: ئەوەی كە زانیمان درۆیەوبەو شتانەی كە لەلامانە جیایەو دژیەتی. سێهەمیان: ئەوانەی كە بێدەنگی لەسەر هەیە، نە لەم شێوەیەو نە لەو شێوەیە، ئەوە باوەڕمان پێی نیەو بە درۆشی نازانین، بەڵام گێڕانەوەی دروستە وەك لە پێشەوە باسمان كرد،ئەوانەی كە هیچ سودێكی تێدا نییە دەگەڕێتەوە بۆ كارە ئاینیەكان، وەك ئەمانەی كە باس دەكەن ناوی هاوەڵانی ئەشكەوت و ڕەنگی سەگەیان و ژمارەیان، عەساكەی موساسەلامی خودای لێبێ لە چ درەختێ بوە. وە ناوی ئەو باڵندانەی كە خودا زیندوی كردەوەبۆ ئیبراهیم و دیاری كردنی ئەو پارچەی كە درا لەو كوژراوە لە مانگاكە. جۆری ئەو درەختەی كە خودا قسەی لەلایەوە كرد لەگەڵ موساداو گەلێ شتی تریش لە خودا لە قورئاندا بە نادیاری هێشتویەتیەوە كە هیچ سودێكی نیە لە دیاری كردنیان.

---

[1] الطبري/١/٨١

[2] فتح الباري/٦/٥٧٢

## پلەو پایەی تەفسیری شوێنکەوتوان-التابعين-

ئەگەر مانای قورئانت لە قورئان و فەرمودە و لە لای هاوەڵەکانی پێغەمبەر(ﷺ)دەست نەکەوت، بێگومان زۆرێ لە پێشەوایان لەوەدا گەڕاونەتەوە بۆ قسەی شوێنکەوتوانی هاوەڵانی پێغەمبەر، وەك مجاهيد، بێگومان موجاهید کەم وێنە بوە لە تەفسیری قورئاندا وەك موحەمەدی کوڕی ئیسحاق دەڵێ : تەبانی کوڕی سالح دەیگێڕێتەوە لە موجاهیدەوە کە ئەڵێت: سێ جار قورئانم پیشانی ئیبنو عەباس داوە، هەر لەسەرەتاوە تا کۆتاییەکەی، لەسەر هەمو ئایەتێکی قەورئان وەستاندومەو پرسیارم لێکردوە لە بارەیەوە[1]، ئیبنو جەریریش ڕیوایەتی کردوە لە ئیبنو مالیکەوەئەڵێت: موجاهیدم بینی پرسیاری لە ئیبنو عەباس دەکرد لەبارەی تەفسیری قورئانەوە وە تەختەکانیشی پێبوە.گوتی:ئیبنو عەباس پێی دەگوت: بنوسە تا پرسیاری گشت تەفسیری لێدەکرد[2] هەر بۆیە ئەبو سوفیانی سەوری دەڵێ: کاتێ لەلای موجاهیدەوە تەفسیرت بۆ هات تەنها ئەو تەفسیرەت بەسە[3]. شوێنکەوتوانی تریش وەك سەعیدی کوڕی جوبەیرو عیکرەمە و عتای کوڕی ڕیباح و حەسەنی بەسری و مەسروقی کوڕی ئەجدەق و سەعیدی کوڕی موسویب و ئەبو لعالیەو ڕەبعی کوڕی ئەنەس و قەتادەو زەححاکی کوڕی موزاحیمو کەسانی تریش لە شوێنکەوتوان ئەوانەش کە دوای ئەوان شوێنیان کەوتون،کە قسەکانیان لە ئایەتێکدا دێنێ، جیاوازی لە دەربڕنەکانیاندا هەیە لە وتەکانیاندا، ئەوەی شارەزایی نەبێ وا دەزانێ جیاوازی لە قسەکانیاندا هەیەو دەیگێڕێتەوە.بەڵام ئەوە بەو شێوەیە نیە ،چونکە هی وایان هەیە دەربڕینێ لە شتێکدا دەکا بە خواست و هاو وێنەی ئەو شتە،هەشیانە دەقێ دێنێ لەسەر شتێ بە شێوەی خۆی،لە زۆر شوێندا هەمویان هەریەك مانایان هەیە،با زیرەك و خاوەن بیرو هۆش ئاگایان لەوە بێ،خودا ڕێمان نیشان بدا.

## تەفسیر بە بیرو بۆچون

بێگومان تەفسیری قورئان بە ڕاو بۆچون حەرامە بە پێی ئەم فەرمودەی کە موحەمەدی کوڕی جەریر ڕحمەتی خوای لێبێ ڕیوایەتی کردوە لە ئیبنو عەباسەوە لە پێغەمبەرەوە(ﷺ) کە فەرمویەتی: کەسێ قسە بە بیرو بۆچونی خۆی بکا لەبارەی قورئانەوە یان بەشتێ کەنایزانێ با

---

[1] الطبري/١/٩٠ ص١٠

[2] الطبري/١/٩٠.

[3] الطبري/١/٩١.

جێگەی و نیشتگەی خۆی ئامادە بکات لە ئاگردا[1]. هەر بەم شێوەیە تیرمزی و نەسائی و ئەبو داود هێناویانە،تیرمزی ئەڵێت ئەم فەرمودەیە، فەرمودەیەکی حەسەنە.

## تەفسیر کردنی زانراو دیار بێدەنگ بون لە نەزانراو

بۆیە کۆمەڵێ لە پێشینەکان تەنگە تاوو نارەحەت دەبون لە تەفسیرکردنی شتێ زانیاریان پێنەبوایە، وەك ئیبنو جەریر ڕیوایەتی کردوە لە ئەبو موعەمەرەوە وتی: ئەبو بەکری سدیق ڕەزای خوای لێبێ گوتی: چ زەمینێ هەڵم دەگرێ و چ ئاسمانێ سێبەرم بۆ دەکات ئەگەر لەبارەی کتێبی خوداوە شتێ بڵێم کەنایزانم[2]. وە دیسان ڕیوایەت کراوە لە ئەنەسەوەکە عومەری کوڕی خەتاب لەسەر مینبەر ئەم ئایەتەی﴿ وَفَٰكِهَةً وَأَبًّا ﴾خوێندەوە واتە: میوەو لەوەڕ، ئەمەیان میوەیە کە زانیومانە ئەی (ئەب) کامەیە؟ پاشان بەخۆیدا چوەوەو وتی: بێگومان ئائەمە خۆ نارەحەت کردنە ئەی عومەر[3]. ئەمە ئەوە دەگەیەنێ کە عومەر ڕەزای خوای لێبێ ویستی مانای الاب دەرکەوێ و بزانێ چیە،ئەگینا دیارە کە ڕوەکێك بوە لە زەویدا و ئاشکرایە شتێك نیە نەزانرێ. وەك خودای گەورە ئەفەرموێت:﴿ فَأَنۢبَتۡنَا فِيهَا حَبّٗا ﴿٢٧﴾ وَعِنَبٗا وَقَضۡبٗا ﴾[4] ئەوسا دانەوێڵەشمان لێڕواند،ڕەزو سەوزایش هەروەتر. ئیبنو جەریر ڕیوایەتی کردوەلە ئیبنو ئەبو مولیکەوەکە ئیبنو عەباس پرسیاری ئایەتێکی لێکرا ئەگەر پرسیار لەهەنێ لە ئێوە بکرایە قسەی تێدا دەکرد نەیویست قسەی تێدا بکات،سەنەدەکانی ڕاستن دیسان ئیبنو ئەبی مولیکە ڕیوایەتی کردوە وتی: پیاوێ پرسیاری لە ئیبنو عەباس کرد لە:﴿تَعۡرُجُ ٱلۡمَلَٰٓئِكَةُ وَٱلرُّوحُ إِلَيۡهِ فِي يَوۡمٖ كَانَ مِقۡدَارُهُۥ خَمۡسِينَ أَلۡفَ سَنَةٖ﴾. لە ڕۆژێکدا ئەندازەکەی هەزار ساڵە، ئیبنو عەباس پێی وت کامەیە کە ﴿تَعۡرُجُ ٱلۡمَلَٰٓئِكَةُ وَٱلرُّوحُ إِلَيۡهِ فِي يَوۡمٖ كَانَ مِقۡدَارُهُۥ خَمۡسِينَ أَلۡفَ سَنَةٖ﴾ لە ڕۆژێکدا ئەندازەکەی پەنجا هەزار ساڵە. پیاوەکە پێی گوت،من بۆیە پرسیارم لێکردی تا بۆم باس بکەی، ئیبنو عەباس وتی: ئەوانە دوو ڕۆژن خودا لە کتێبەکەیدا باسی کردون و خۆی زاناترە

[1] الطبري /١/٧٧/تحفة الاحوذي/٨/٢٧٧/النسائي في فضائل القرءان/١١٤/أبو داود/في العلم من رواية أبي الحسن بن العبد –قالة المزي في اللاطراف/٤/٤٢٣.

[2] الطبري/١/٧٨.

[3] الطبري/٢٤/٢٢٩ ص١٠.

[4] عبس ٢٧–٢٨.

پێیان پێم ناخۆش بو قسە بکا لەبارەی کتێبی خوداوە بە شتێ کە نەیزانێ لەیس گوتی: لە یەحیای کوڕی سەعیدەوە لە سەعیدی کوڕی موسەیبەوە کە قسەی لە قورئاندا نەدەکرد جگە لە دیارو ئاشکراکان[1] ئەیوب و ئیبنو عەون و هیسامی دەستوائی گوتیان: لە موحەمەدی کوڕی سیرینەوە گوتی: پرسیارم لە عوبابیدەی سەلمانی کرد لەبارەی ئایەتێکی قورئان گوتی: بڕۆ بۆلای ئەوانەی کە دەیان زانی لەسەر چی قورئان هاتۆتە خوارەوە لە خوا بترسە، ڕاست و دروست وەرگرە[2]. شەعبی ڕیوایەتی کردوە لە مەسروقەوە گوتی:خۆ بپارێزن لە تەفسیر کردن، چونکە ئەو تەفسیر کردنە گێڕانەوەیە لە خوداوە، ئائەم پاشماوە ڕاستانە و هاوێنەیان لە هاوەڵەکانی پێغەمبەر(ﷺ) پێشەوایانی پێشینە ئەوە دەگەیەنێ کە زۆر خۆیان لاداوەو پاراستوە لە تەفسیر کردنێ کە شارەزاییان لە بارەیەوە نەبوبێ. بەڵام کەسێ شارەزایی هەبێ لە بارەی زمان و شەرعەوە تاوانبار نابێ، لەبەر ئەوەیە لەوانەو کەسانی تریشەوە قسە ڕیوایەت کراوە لەبارەی تەفسیری قورئانەوە دژایەتیش لە قسەکانیاندا نەبو چونکە ئەوانە لە شتێکدا ئەدوان کە دەیانزانی کە نەیان زانیایە بێدەنگ دەبون. ئەمیش پێویستە لەسەر هەمو کەسێ وابێ، هەرچۆنێ بێدەنگ بون پێویستە لەسەر شتێ کە مەردوم شارەزایی لێی نیە،هەر بەو شێوەیەش قسە کردن لەسەر شتێ کە پرسیاری لە بارەوە دەکرێ و دەیزانێ پێویستە وەك خوای گەورە ئەفەرموێت: ﴿ وَإِذْ أَخَذَ ٱللَّهُ مِيثَـٰقَ ٱلَّذِينَ أُوتُوا۟ ٱلْكِتَـٰبَ لَتُبَيِّنُنَّهُۥ لِلنَّاسِ وَلَا تَكْتُمُونَهُۥ فَنَبَذُوهُ وَرَآءَ ظُهُورِهِمْ وَٱشْتَرَوْا۟ بِهِۦ ثَمَنًا قَلِيلًا ۖ فَبِئْسَ مَا يَشْتَرُونَ ﴾[3]. بە مەردومی ڕاگەیەنن و نەیشارنەوە. لەم فەرمودەیەدا کە لەزۆر ڕێگەوە ڕوایەت کراوە هاتوە : هەرکەسێپرسیاری لێ بکرێ لە زانیاریەك و شاردیەوە لە ڕۆژی قیامەتدا لەغاو دەکرێ بە لغاوی ئاگر[4].

### شێوازو جۆری تەفسیر کردن

ئیبنو جەریر ئەڵێت: موحەمدی کوڕی بەشار بۆی گێڕاینەوە گوتی: موئەمەل بۆی گێڕاینەوە گوتی: سوفیانی کوڕی ئەبو زینادبۆی گێڕینەوە گوتی: ئیبنو عەباس گوتی: تەفسیر دەکرێ بە

---

[1] الطبري/١/٨٦.

[2] الطبري/١/٨٦.

[3] ال عمران ١٨٧

[4] أحمد/٢/٢٦٣/٣٠٥/٤٩٥/تحفة الاحوذي/٧/٤٠٧/الحكام/١/١٠١/ص١١ فەرمودەیەکی باشە(جید).

چوار بەشەوە: تەفسیرێ عەرەبەکان لە وتەکانی خۆیاندا دەی زانن، تەفسیرێ هیچ کەس چاوپۆشی لێناکرێ نەیزانێ وە تەفسیرێ زانایان دەیزانن وە تەفسیرێ هیچ کەسێ جگە لە خودا نایزانێ[1].

## سورەتە مەکەیی و مەدینەیەکان

هەمام ڕیوایەتی کردوە لە قەتادەوەئەڵێت: ئەو قورئانەی لە مەدینە هاتۆتە خوار بەقەرەو ئالی عیمران و نیساو و مائیدەو بەرائەت و ڕەعد و نەحل و حەج و نورو ئەحزاب وموحەمەد و فەتح و حوجورات و ڕەحمان و حەدید و موجادەلەو حەشرو مومتەحین و سەف و جومعە و مونافیقون و تەغابون و تەلاق بوە لەگەڵ ﴿يَٰٓأَيُّهَا ٱلنَّبِيُّ لِمَ تُحَرِّمُ﴾تا ئایەتی دەی و﴿إِذَا زُلْزِلَتِ ٱلْأَرْضُ زِلْزَالَهَا و إِذَا جَآءَ نَصْرُ ٱللَّهِ وَٱلْفَتْحُ﴾ ئەم سورەتانە لە مەدینە هاتونەتە خوار، سورەتەکانی تر هەمو لە مەدینە هاتونەتە خوار[2].

## ژمارەی ئایەتەکانی قورئانی پیرۆز

ژمارەی ئایەتەکانی قورئانی پیرۆز سەش هەزار ئایەتە، پاشان ڕای جیاواز هەبوە لەسەر ئەوەی کە زیاترە،هەندێکیان هیچیان لەو ژمارەیە زیاد نەکردوە،هەندێ گوتویانە شەش هەزارو دووسەدو نۆزدە ئایەتە، وە گوتراوە:شەش هەزارو دووسەدو بیست و پێنج یان بیست و شەش ئایەتە، وە گوتراوە: شەش هەزارو دووسەدو سیی و شەش ئایەتە، ئەمە ئەبو عەمری دانی کێڕاویەتیەوە لە کتێبەکەیدا بەناوی البیان.

## ژمارەی وتەو پیتەکانی قورئان

وتەکانی قورئانی پیرۆز، فەزل کوڕی شازان ئەڵێت: کە عەتای کوڕی یەسار گوتی: حەفتاو حەوت هەزارو چوارسەدو سی و نۆ وتەیە ٧٧٤٣٩ بەڵام عەبدڵای کوڕی کەسیر لە موجاهیدەوە ئەڵێت: ئەمەی کە لە قورئاندا هەژمارمان کردوە قورئانی پیرۆز پێك هاتوە لە سێ سەدو بیست و یەك هەزارو سەدو هەشتاونۆ پیت ٣٢١١٨٩ فەزل لە عەتای کوڕی یەسارەئەڵێت: سێ سەدو بیست و سێ هەزارو پانزە پیتە ٣٢٣٠١٥. سەلام ئەبو مەحەمەدی حەمانی گوتی:حەجاج قورئان خوێن و قورئان لەبەرەکان و نوسەرانی قورئانی کۆکردەوەو گوتی: پێم بڵێن قورئان لە چەند

---

[1] الطبری/١/٧٥

[2] اللاتقا/١/٢٨.

پیت پێك هاتوه؟ گوتی هەژمارمان کرد هەموو گوتیان: قورئان پێك هاتووه لە سێ سەدو چل هەزارو حەوت سەد و چل پیت.

## دابەش کردنی تری قورئانی پیرۆز

حەجاج گوتی:ناوەڕاستی قورئانم پێ بڵێن، گوتیان: ناوەڕاستی قورئان لە سەورەتی کەهفدایە تا پیتی فایە-الفاء- لە وتەی: ﴿ وَكَذَٰلِكَ بَعَثْنَٰهُمْ لِيَتَسَآءَلُوا۟ بَيْنَهُمْ ۚ قَالَ قَآئِلٌ مِّنْهُمْ كَمْ لَبِثْتُمْ ۖ قَالُوا۟ لَبِثْنَا يَوْمًا أَوْ بَعْضَ يَوْمٍ ۚ قَالُوا۟ رَبُّكُمْ أَعْلَمُ بِمَا لَبِثْتُمْ فَٱبْعَثُوٓا۟ أَحَدَكُم بِوَرِقِكُمْ هَٰذِهِۦٓ إِلَى ٱلْمَدِينَةِ فَلْيَنظُرْ أَيُّهَآ أَزْكَىٰ طَعَامًا فَلْيَأْتِكُم بِرِزْقٍ مِّنْهُ وَلْيَتَلَطَّفْ وَلَا يُشْعِرَنَّ بِكُمْ أَحَدًا ﴾[1]دا. سێیەکی ئەوەڵی تا ئایەتی سەدی سورەتی بەڕائات، سێیەکی دووەمی تا ئایەتی سەد یان سەدو یەکی شوعەرایە، سێیەکی سێهەمی تا کۆتایی قورئانە. وە حوت یەکی ئەوەڵی قورئان تا پیتی داله لەم ئایەتەدا کە خودای گەورە ئەفەرموێت﴿ فَمِنْهُم مَّنْ ءَامَنَ بِهِۦ وَمِنْهُم مَّن صَدَّ عَنْهُ ۚ وَكَفَىٰ بِجَهَنَّمَ سَعِيرًا﴾[2]. حەوت یەکی دوهەمی تا پیتی تایە-التاء-لەم ئایەتەدا لە سورەتی ئەعرافدا کە ئەفەرموێت:﴿ وَٱلَّذِينَ كَذَّبُوا۟ بِـَٔايَٰتِنَا وَلِقَآءِ ٱلْءَاخِرَةِ حَبِطَتْ أَعْمَٰلُهُمْ ۚ هَلْ يُجْزَوْنَ إِلَّا مَا كَانُوا۟ يَعْمَلُونَ ﴾[3]. حەوت یەکی سێهەم تائەلفی-الألف- دووهەم لە سورەتی ڕەعدا کە خودای گەورە ئەفەروێت﴿مَّثَلُ ٱلْجَنَّةِ ٱلَّتِى وُعِدَ ٱلْمُتَّقُونَ ۖ تَجْرِى مِن تَحْتِهَا ٱلْأَنْهَٰرُ ۖ أُكُلُهَا دَآئِمٌ وَظِلُّهَا ۚ تِلْكَ عُقْبَى ٱلَّذِينَ ٱتَّقَوا۟ ۖ وَّعُقْبَى ٱلْكَٰفِرِينَ ٱلنَّارُ ﴾[4] حەوت یەکی چوارهەم تا ألفی- الألف -لە سورەتی حەجدا. خودای گەورە ئەفەرموێت:﴿ وَلِكُلِّ أُمَّةٍ جَعَلْنَا مَنسَكًا لِّيَذْكُرُوا۟ ٱسْمَ ٱللَّهِ عَلَىٰ مَا رَزَقَهُم مِّنۢ بَهِيمَةِ ٱلْأَنْعَٰمِ ۗ فَإِلَٰهُكُمْ إِلَٰهٌ وَٰحِدٌ فَلَهُۥٓ أَسْلِمُوا۟ ۗ وَبَشِّرِ ٱلْمُخْبِتِينَ ﴾[5]. حەوت یەکی پێنجەم تا هایە-الهاء-خودای گەورە لە سورەتی

---

النساء ٥٥. [2]

الاعراف ١٤٧. [3]

الرعد ٣٥. [4]

الحج ٣٤. [5]

ئەحزابدا ئەفەرموێت: ﴿وَمَا كَانَ لِمُؤْمِنٍ وَلَا مُؤْمِنَةٍ إِذَا قَضَى اللَّهُ وَرَسُولُهُ أَمْرًا أَن يَكُونَ لَهُمُ الْخِيَرَةُ مِنْ أَمْرِهِمْ وَمَن يَعْصِ اللَّهَ وَرَسُولَهُ فَقَدْ ضَلَّ ضَلَالًا مُّبِينًا﴾[1]. شەشەم تا واو –الواو– خودای گەورە لە سورەتی فەتحدا ئەفەرموێت: ﴿وَيُعَذِّبَ الْمُنَافِقِينَ وَالْمُنَافِقَاتِ وَالْمُشْرِكِينَ وَالْمُشْرِكَاتِ الظَّانِّينَ بِاللَّهِ ظَنَّ السَّوْءِ عَلَيْهِمْ دَائِرَةُ السَّوْءِ وَغَضِبَ اللَّهُ عَلَيْهِمْ وَلَعَنَهُمْ وَأَعَدَّ لَهُمْ جَهَنَّمَ وَسَاءَتْ مَصِيرًا﴾[2]. حەوتەم تا كۆتایی قورئانە. سەلامیانی ئەبو موحەمەد گوتی: ئەوەمان لە ماوەی چوار مانگدا زانی واتە: تەواو كرد، گوتیان:حەجاج هەمو شەوێك چوار یەكی قورئانی دەخوێند، لە شەوی یەكەمدا تا كۆتایی ئەنعامی دەخوێند، لە شەوی دوەمدا تا–ولیتلطف–ی سورەتی كەهفی دەخوێند، لە شەوی سێهەمدا تا كۆتایی سورەتی زومەری دەخوێند، لە شەوی چوارەمدا تا كۆتایی قورئانی دەخوێند، ئەبو عومەری دانی لە كتێبەكەیدا البیانات بە پێچەوانەی هەموو ئەمانەوە گێڕاویەتیەوە والله اعلم.

## بەش بەش و پارچە پارچە كردن

ڕای جیاواز هەیە لەبارەی واتای سەورەتەوە كە لە چیەوە هاتوە، گوتراوە: لە بەرزی و بڵندیەوە هاتوە نایفە گوتی: (ألم تر أن الله أعطال سورة ترى كل ملك دونها) وەك ئەوەی خوێنەر پێی دەڕوا لە پلەیەكەوە بۆ پلەیەكی تر. وەگوتراوە: لەبەر بەرزی و بڵندیەتی وەك شورەو دیواری ولأتان، وەگوتراوە: ناونراوە سورەت لەبەر ئەوەی كە بەش و پارچەیەكە لە قورئان، دەرهێنراوە داتاشراوە لە من أسار الأناء واتە: لە پاشماوەی دەفرەوە، بەم پێیە بنچینەكەی بە همزە هاتوە، بۆیە همزەكەی سووك كراوەو گۆڕاوە بە واو، چونكە پێشەكی واوێكی لەسەر دانراوەو(مضموم) كراوە وەگوتراوە: لەبەر تەواوی و ڕێكی و پێكی، چونكە عەرەبەكان بە وشتری ڕێك و پێك و تەواو دەڵێن سورە، منیش دەڵێم: لەوانەیە لەبەر ئەوە بێت ئایەتەكانی كۆكردوەتەوەو دەورەی داون. وەك دیواری ولأتان كە چوار دەوری شوێن و ماڵەكانی داوە، كۆی السور، سور بە فەتحی واوەكە، هەنێ جاریش جەمع كراوە بە سورات و سورات .

---

[1] الأحزاب ٣٦.

[2] الفتح ٦.

## مانای ئایەت

بەلاّم ئایەت نیشانەیە لەسەر دابڕانی ئەو وتەی پێش خۆی لەوەی کە لە دوایەوە دێ وە جیا بوەتەوە لێی، واتە: جیاکەرەوەیە لە ئایەتەکەی ترو بە تەنهایە،خودای گەورە ئەفەرموێت: ﴿وَقَالَ لَهُمْ نَبِيُّهُمْ إِنَّ ءَايَةَ مُلْكِهِۦٓ أَن يَأْتِيَكُمُ ٱلتَّابُوتُ فِيهِ سَكِينَةٌ مِّن رَّبِّكُمْ وَبَقِيَّةٌ مِّمَّا تَرَكَ ءَالُ مُوسَىٰ وَءَالُ هَٰرُونَ تَحْمِلُهُ ٱلْمَلَٰٓئِكَةُ ۚ إِنَّ فِى ذَٰلِكَ لَءَايَةً لَّكُمْ إِن كُنتُم مُّؤْمِنِينَ﴾[1] .نیشانەی پاشایەکەی ، گوتراوە: ناونراوە أية چونکە سەرسوڕهێنەرە، مەردوم دەستەوستانە لەوەی کە وەك ئەو بێنێ. سیبەوەهی ئەڵێت: إية سەرچاوەکەی لە(أيية) هاتوە وەك أكمة وشجرة یائەکە-اليا-بزوێنەری بۆ دانراوە پێشەکیش فەتحەی بۆ کراوەو گۆڕاوە بە ئەلف وبوە بە -أية- لە -أييه- لەسەر وەزنی-أمنة- گۆڕاوەو کراوە بە ئەلف پاشان سڕاوەتەوە لەبەر تێکەڵاو بونی فراء-الفراء- گوتی سەرچاوەکەی -أية- بە تەشدید کردنی یائەکە -اليا-،یائی یەکەم گۆڕاوەو کراوە بە ئەلف -ألف- لەبەر ناخۆشی و گرانی تەشدیدەکە و بوە بە -أية- کۆی -أية- تیش -أي و أيات و أياي -یە.

## مانای ووشە

وشە تەنیا یەك وتەیە ،لە دوو پیت پێك دێت وەك -ما- و- لا- و هاو وێنەیان ،یان لە دوو پیت زیاتر پێك دێت زۆرترینی دە پیتە وەك-ليستخليفنهم- وە - هەنێ جاریش یەك وشە ئایەتێکە وەك -والفجر- والضحى- والعصر- ألم- طه -يس- حم- بە پێی قسەی کوفیەکان، وە -الم عسق-یش لای ئەوان دوو وشەیە بەلاّم کەسانی تر غەیرەز ئەوان ناوی ئایەتی لێ نانێن، بەلکو دەلێن: ئەمانە سەرەتای سورەتەکانن، ئەبو عومەری دانی ئەلێت: وا نازانم وشەیەك بەتەنیا ئایەتێ بێجگە لەم ئایەتەی سورەتی ڕەحمان کە خودای گەورە ئەفەرموێت ﴿مُدْهَآمَّتَانِ﴾[2].

## لالە پەتێ -العجمە- و قورئان

قورتوبی ئەلێت: کۆ دەنگی هەیە لەسەر ئەوەی کە لەناو قورئاندا هیچ پێکهاتەیەکی غەیرە عەرەبی نیە، وە کۆ دەنگیش هەیە کە چەند ناوێکی غەیرە عەرەبی لە قورئاندا هاتوە وەك

---

[1] البقرة ٢٤٨.

[2] تحفةالاحوذي/٨/٢٩٣ ص١٥/فەرمودەیەکی سەحیحە.

ئیبراهیم و نووح و لووت، وە ناکۆکی لەسەر ئەوەی ئایا شتێکی تر جگە لەمانە لە قورئاندا هەیە، باقیلانی و تەبەری ئەوە ناسەلمێنن و دەڵێن: ئەوەی کە تیایەتی و ڕێکدەکەوێ لەگەڵ عەجەمیدا ئەوە لەو بەشانەیە کە زمانەکان تێیدا ڕێککەوتون.

## سوپاس نامە

١- سوپاس و ڕێزی بێپایانم بۆ برای دڵسۆز و بەڕێزم مامۆستا ئیکرام کەریم،ئەگەر ئەو نەبوایە ڕەنگە وەرگێڕنی ئەم تەفسیرە بۆ بەچاپ گەیاندن بکەوتایەتە پاش مردنم، کاتێ کە جەنابی زانی خەریکە تەواوی بکەم،کەوتینە ڕاوێژ لەو بارەیەوە،من خۆم بەنیاز بووم کە تەواوم کرد منداڵەکانم هەڵی گرن دوای مردنم بیر لەچاپ کردنی بکەنەوە. بەڵام بەڕێزی ڕای وانەبوو بەڵکو زۆر هانەی دام کە دوای نەخەم و فەرمووی: من پیاچوونەوەو هەڵەچنینی دەگرمە ئەستۆی خۆم بە ئیزنی خودای مەزن،قسەکەی ناخمی هەژاند و زۆر دڵخۆشی کردم،خودای گەورە بەختەوەری دونیاو قیامەتی بکات. ئێستا ئەو ئەرکە گرانەی گرتوەتە سەرشانی خۆی، لەگەڵ ئەو هەموو سەرقاڵیەی خۆیدا بەنووسینەوە. بەشێکی زۆر لەکاتی خۆی تەرخان کردووە بۆ پیاچوونەوە و (١١)جزمی لێهەڵە چن کرد داواشم لێکردبوو هەر هەڵەیەکم هەیە لەوەرگێڕانەکەدا بەتایبەتی لە فەرموودەکاندا بۆم ڕاست بکاتەوە،چونکە هەموو کەسێ شایەنی هەڵەیە،هەر خودای مەزن هەڵە ناکات. وە خۆم دەزانم مامۆستا ئیکرام زۆر لەخۆم زیاتر گرنگی پێئەدات و مەبەستیەتی،چونکە خۆی هەمیشە لەگەڵ قورئان و فەرمودەکانی پێغەمبەرو زانایانی پێشینەو پاشینەدا ژیان بەسەر دەبات و دەیەوێ نەوەکانی نوێ ڕێنمایی و شارەزا بکات بەو شێوەیە. خودای گەورە پاداشتی بداتەوەو پیت و بەرەکەت بخاتە کارەکانیەوە و خۆیی و ماڵ و منداڵی بەختەوەری هەردوو دنیا بکات.

٢- بەڕێز مامۆستا ئیکرام ئاگاداری کردم کاك فایەق کە خەریکی کۆمپیوتەر کردنی تەفسیرەکەیە تەنیا جزمێکی ماوە تەواوی بکات بەڵام داوای لێبوردن دەکات و ناتوانێ بە چاپی بگەیەنێ،خۆیشی سەرقاڵی خوێندن دەبێت لەدەرەوەی وڵات و وتی بەڵکو خۆت خەمێکی تەفسیرەکە بخۆیت. منیش بەڕێز مامۆستا شێخ موحەمەد شێخ ڕەئوف کە چاوم پێی کەوت باسەکەم بۆ گێڕایەوە بەڕێزیشی فەرمووی ئەو (١٩)جزمەی کە ماوەتەوە لەگەڵ ئەویشا کە هەڵە چن کراوە،وەری بگرەوەو ڕەوانەی کە بۆم بە پشتیوانی خودای مەزن هەڵە چنیشی دەکەین و بە چاپیشی دەگەیەنم،خودای گەورە پاداشتی بداتەوە و بەر سۆزو بەزەیی خۆی بخات و بەختەوەری دنیاو ڕۆژی قیامەتی بکات،بەڕاستی زۆر دڵخۆشی کردم خودای مەزن هەرگیزناخۆشی نەهێنێتە ڕێگەیی و لەتۆماری کرداریدا بەچاکە بۆی بنوسێت.

٣- دوعای خێر دەکەم بۆ خێزانەکەم هەموویان کە زۆر هاوکارم بوون بەتایبەتی (نیگاری کچم) کە هەموو تەفسیرە وەرگێڕاوەکەی بۆ خوێندومەتەوەوئەگەر هەڵە هەبوبێ چاکمان کردووە، چەند جزمێکیشی دوبارە بۆ نوسیومەتەوە و هەمیشە بەدەممەوە بووە لەوەی ئەم چەند ساڵەدا، خوا پاداشتی بداتەوە.

٤- خودا پاداشتی حاجی سیدتوفیقی سید عبدالرحیم تاوەگۆزی بداتەوە کە ئەو ئایەتانەی ژمارەکەی دیاری نەکرابوو بۆی دیاری کردین.

علی حاجی عبداللەی پریسی

## بەناوی خودای دەهەندەی دلۆڤان

سوپاس بۆ پەروەردگاری جیهان،درودو ستایش بۆ پێغەمبەرو بەندە خودا موحەمەد(ﷺ) کە بەرێزترین و دواین پێغەمبەرەو لەسەر ئال و بەیتی و هاوەڵەکانی و هەرکەسێ ڕێرەوی ئەو دەگرێتە بەرو لەسەر ڕێبازی ئەو بەردەوامە تا ڕۆژی قیامەت.

بەڕێزان: هەرکەسە لە دونیادا ئاوات و خۆزگەیەکی خۆی هەیە،پێی خۆشە هەوڵی بۆ بدات و سەرکەوتنی تێدا بەدی بهێنێ،منیش ئاوات و خۆزگەم ئەوە بوو کە خودای مەزن بەسۆز و بەزەیی خۆی یارمەتیم بدا بۆ کارێ کە خزمەتی ئاینەکەی ئەوی پێبکەم. خودای مەزن ئەوەی بۆ ڕەخساندم،بەڕێز مامۆستا صدیق عبدالعزیز خوا پاداشتی بداتەوە ئەم خولاسەی تەفسیری ئیبنو کەسیرەی لە سعودیەوە بەدیاری پێدرا بە ناونیشانی (المصباح المنیر فی تهذیب تفسیر ابن کثیر) کۆمەڵێ لەزانایان بەسەر پەرشتی (شیخ صفی الرحمن المبارکفوری) هەستابوون بەکورت کردنەوەی تەفسیری ئیبنو کەسیر،منیش هەربەبینینی زۆر شادمان بووم، لە کتێبخانەکەی ماڵی مامۆستا هێنامەوە بۆ ماڵەوە،سەیرم کرد ئەوەی من بەدوایدا وێڵم و دەگەڕێم ئەمەیە،بۆیە پاڕامەوە لەخودای مەزن هەرچەندە من خۆم بە پیاوی ئەم کارە گرانە نازانم کە یارمەتیم بدات و مۆڵەتم بدات ئەم ماوەی تەمەنم کەماوە لەژێر سێبەری قورئانەکەی ئەودا بەسەر بەرم،ئەگەر لێم وەرگرێ بیکەمە توێشویە بۆئەو ڕۆژەی کە هیچ شتێك فریا ناکەوێ تەنیا کارێ نەبێ بەدڵپاکی بۆ خودا خۆی کرابێ. منیش خۆم بە عەبدێکی هەژاو لاوازی ئەو دەزانم و بێهیواش نیم لە سۆزو بەزەیی خودای مەزن،سا بەڵکو مسوڵمانان توشی خێرو بێر ببن و لێیەوە دوعای خێریش بۆ من بکەن تا منیش بەشدار بم لەو خێرەدا وەك پێغەمبەری خودا(ﷺ) فەرمویەتی: کاتێك کەسێك مرد دەستبەرداری هەموو کردارێك دەبێت،جگە لە سێ شت،خێرێکی نەبڕاوەو بەردەوام،یا زانستێك کە سودی لێوەرگیرێ،منداڵێکی باشی هەبێ دوعای خێری بۆ بکات.

وەهەر برایەکی بەڕێزیش بەخۆیدا ڕاببینێ و بتوانێ وەری گێڕێتە سەر زمانی فاسی یان بادینی، ستایشی دەکەم و داوای سەرکەوتنی بۆ دەکەم لەلای خودای مەزن.

علی حاجی عبداللەی پریسی

## سەرچاوەکانی ئەم وەرگێڕانە

١- تەفسیری ئیبنو کەسیر/بەتەحقیقی عەبدوڕەزاق مەهدی کە فەرمودەکانی تەخریج کردووە.

٢- وەرگێڕانی مامۆستا هەژار/وەرگێڕانی منیش،هەر وەرگێڕانەکەی ئەوە لە تەفسیری قورئانەکەدا بەهەندێ دەسکاری کەمەوە لە ووشەکاندا.

٣- پوختەی تەفسیری قورئان/مامۆستا ملا موحەمەدی ملا سالّح (بامۆکی).

٤- فتح الباری شرح صحیح البخاری.

٥- اقتران النیرین/مجمع البحرین/مامۆستا ملا ڕەشید بەگی بابان بە لێکۆڵینەوەی/مامۆستا موحەمەد عەلی قەرەداغی.

٦- پوختەی سەحیحی موسلیم/بەرگی١-٢ وەرگێڕنی لیژنەیەك.

٧- المنجد فی اللغه و الاعلام.

٨- مختار الصحاح/محمد بن أبی بکر بن عبدالقادر الرازی.

٩- فەرهەنگی گیرفانی ئاسان/ئامادەکردنی: ئاکۆ فاتح.

لەشەوی ١٧ای رمضان ساڵی ١٤٢٣ كۆچی، مانگی ٢٠٠٢/١١ زاینی دەستم كرد بە نوسینی ئەم تەفسیرە. سوپاس و ستایش بۆ خودای مەزن وەرگێڕانی ئەم تەفسیرەم تەواو كرد (كورتەی تەفسیری ئیبنو كەسیر) لە٦ی شعبانی ١٤٣٠ای كۆچی ٢٠١٠/٧/١٨ زاینی. ئەی خودایە لێت دەپاڕێمەوە لێم وەرگری و بێ هیوام نەكەی.

علی حاجی عبداللەی پریسی

## سورەتی ( فاتیحە )

## بەناوی خودای دەهەندەی دلۆڤان

### ناوەکانی سورەتی فاتیحەو واتاکانی

پێی دەگوترێ سەرەتا، واتە سەرەتای ئەم کتێبە بە نووسراوی، وە بەم سەرەتایە دەست بە نوێژکردن دێ، وە پێشی دەگوترێ سەرچاوەو دایکی ئەم کتێبە، واتە ئەم قورئانە لای زۆرینەی زانایان، وە لە فەرمودەی سەحیحدا هاتوەو ترمزیش بە سەحیحی داناوە لە ئەبو هورەیرەوە ئەڵێت: پێغەمبەری خودا(ﷺ) فەرمویەتی﴿ٱلْحَمْدُ لِلَّهِ رَبِّ ٱلْعَـٰلَمِينَ ﴾ سەرچاوەی ئەم قورئانە و دایکی ئەم کتێبەیە و حوت نیشانەی دوبارە کراوە وتی ئای گەورەیشە. وەپێی دەگوترێ (الحمد) و پێشی دەوترێ (الصلاة) وەك پێغەمبەری خودا(ﷺ) لە لایەن خودای گەورە ئەفەرموێت: نوێژم دابەش کردوە لە نێوان خۆم و لە نێوان بەندەکانمدا بە دوو بەش کاتێ ئەو بەندەیە گوتی: ﴿ٱلْحَمْدُ لِلَّهِ رَبِّ ٱلْعَـٰلَمِينَ ﴾ واتە: سوپاس بۆ خودای پەروەردگاری جیهان، خودای گەورە ئەفەرموێت: حمدنی عبدی واتە: بەندەکەم ستایشی کردم. فاتیحە بە نوێژیش ناوی هێنراوە. چونکەفاتیحە مەرجێکە لەنوێژدا. نوشتەیش پێ دەگوترێ، بە پێی فەرمودەکەی ئەبو سەعید کە لە بوخاری و موسلیمدا هاتوە کە نوشتەی پێکراوە بۆ پیاوە مار گەستوەکە پێغەمبەری خودا(ﷺ)پێی گوت: تۆ چۆنت زانی ئەوە نوشتەیە[1]. ئیبنو عەباس و قەتادەو ئەبولعالیە گوتیان: ئەم سورەتی فاتیحەیە لەمەککە هاتوەتە خوار بەپێی ئەم ئایەتە کە خودای گەورە ئەفەرموێت: ﴿وَلَقَدْ ءَاتَيْنَـٰكَ سَبْعًا مِّنَ ٱلْمَثَانِى وَٱلْقُرْءَانَ ٱلْعَظِيمَ﴾ واتە: ئێمە حەوت نیشانە دوبارە کراوەکەی(فاتیحامان) داوە بەتۆوقورئانی گەورەش. خودای گورەش خۆی باشتردەزانێ.

### ژمارەی ئایەتەکانی فاتیحە

ژمارەی ئایەتەکانی سورەتی فاتیحە حەوت ئایەتە بەبێ ناکۆکی(بسم الله) ئایەتێکی سەربەخۆیە لە سەرەتایەوە، وەك لەلای زۆرێ لە زانایانی قورئان خوێنی کوفەییەکان و کۆمەڵێ لە هاوەڵەکانی پێغەمبەر(ﷺ) شوێنکەوتوانیان و خەڵکێکی تریش لە زانایانی پاشینە وە بەو زوانە لە شوێنی خۆیدا ڕون دەکرێتەوە بە یارمەتی خودای گەورە، پشت و پەناش هەر بە ئەوە.

### ژمارەی وشەو پیتەکانی

بوخاری لەسەرەتای کتێبی تەفسیرەکەیدا: ناو نراوە دایکی کتێب لەبەر ئەوەی لە سەرەتاوە دەست بەنوسینی دەکرێ لە قورئاندا و دەست بە خوێندنیشی دەکرێ لە نوێژدا[2]. وە گوتراوە: بۆیە

---

[1] فتح الباري/٤/٥٢٩.

[2] فتح الباری/٨/٦ ص١٢.

بەوە ناونراوە لەبەر گەڕانەوەی گشت واتاکانی قورئان بۆ ئەوەی ئەو لە خۆی گرتوەو لە ناویدایە. ئیبنو جەریرئەڵێت: عەرەبەکان هەموو کۆکەرەوەی کارێ یان پێشەنگی کردبێ ئەگەر شوێن کەوتەی بوبێ ئەوە بە پێشەنگ و کۆکەرەوەی ئەو کارانەیان داناوەو پێیان گوتوە دایك و سەرچاوە، وە بەو پێیەی کە مێشك کۆدەکاتەوە پێی دەگوترێ دایك یان سەرچاوەی سەر، وە بە ئاڵاو بەیداخی سوپایەك کە لە ژێریدا کۆدەبنەوە دەڵێن: دایك یان سەرچاوە. وەگوتی: مەککە بە دایکی شارەکان ناوبراوە. چونکە لە هەمویان لە پێشتر بووەو ئەوانیشی لە خۆی گرتووە. گوتراوە: لەبەر ئەوەی زەوی لە ئەوەوە لە مەککەوە پان و درێژ کراوەتەوە[1]. ئیمامی ئەحمەد ڕیوایەتی کردوە لە ئەبو هورەیرەوە لە پێغەمبەرەوە(ﷺ) کە لەبارەی فاتیحەوە فەرمویەتی: فاتیحە دایکی قورئانەو حەوت ئایەتە دووبارە کراوەکەیە و قورئانی گەورەیشە[2]. ئەبو جەعفەر مەحەمەدی کوڕی تەبەری ڕیوایەتی کردوە لە ئەبو هورەیرەوە ڕەزای خوای لێبێت لە پێغەمبەری خوداوە(ﷺ) ئەفەرموێت: فاتیحە دایکی قورئانە و سەرەتای ئەم کتێبەیە واتە قورئان، حەوت ئایەت دووبارە کراوەکەیش[3].

### باسی ئەوەی کە لەبارە ڕێزی فاتیحەوە هاتووە

ئیمامی ئەحمەد ڕیوایەتی کردووە لە موسەنەدەکەیدا لە ئەبو سەعیدی کوڕی موعەلاوە ڕەزای خوای لێبێت وتی: من نوێژم دەکرد پێغەمبەری خودا(ﷺ) بانگی کردم وەلامم نەدایەوە تا نوێژەکەم تەواو کرد، وتی پاشان چوومە خزمەتی،فەرمووی: چی ڕێگری لێکردی بێیتە لام، وتی: وتم: ئەی پێغەمبەری خوا(ﷺ)من لەو کاتەدا نوێژم دەکرد،فەرمووی: ئەی خودای گەورە نەی فەرمووە: ﴿ يَٰٓأَيُّهَا ٱلَّذِينَ ءَامَنُواْ ٱسۡتَجِيبُواْ لِلَّهِ وَلِلرَّسُولِ إِذَا دَعَاكُمۡ لِمَا يُحۡيِيكُمۡۖ وَٱعۡلَمُوٓاْ أَنَّ ٱللَّهَ يَحُولُ بَيۡنَ ٱلۡمَرۡءِ وَقَلۡبِهِۦ وَأَنَّهُۥٓ إِلَيۡهِ تُحۡشَرُونَ ﴾[4] ئەی کۆمەڵی خاوەنباوەڕان! هەرکاتێ خوداو پێغەمبەر داواتان لێدەکەن هەر کارێ بکەن ئێوەی پێ ببوژێتەوە، خێرا بیکەن. پاشان فەرمووی: ئایە گەورەترین سورەتی قورئانت فێر بکەم پێش ئەوەی لە مزگەوت بچیتە دەرەوە. وتی: دەستی گرتم کەویستی بچێتە دەرەوە لە مزگەوت وتم: ئەی پێغەمبەری خوا تۆ فەرمووت: فێری گەورەترین سورەتت دەکەم لە قورئاندا فەرمووی: بەڵێ: ﴿ٱلۡحَمۡدُ لِلَّهِ رَبِّ ٱلۡعَٰلَمِينَ ﴾ حەوت ئایەتە دوبارە کراوەکەیە و قورئانی

---

[1] الطبری/١/١٠٧.

[2] أحمد/٢/٤٤٨.

[3] الطبری/١/١٠٧.

[4] الأنفال ٢٤.

مەزنە کەپێم دراوە[١]. هەروایش بوخاری ڕیوایەتی کردووە[٢]. ئەبو داودو نەسائی و ئیبنو ماجەیش ڕیوایەتیان کردوە[٣]. فەرمودەیەکی تر، بوخاری ڕیوایەتی کردوە لە ئەبو سەعیدی خودریەوە لە چاکەکانی قورئاندا گوتی: ئێمە لەسەفەرێکدا بووین و دابەزین بۆ پشودان کیژێك هاتو وتی: گەورەی ناوچەکەمان گە زراوە،کە ئێمە لای دەرچوین لە هۆش خۆی چوبو، ئایە نوشتەکەرتان لە نێواندایە؟ پیاوێ لەگەڵی هەڵسا کە ناوبانگی نوشتەکردنی نەبو لەلامان، نوشتەی بۆ کردو چاك بووەوە، فەرمانی دا کە سی مەڕی بدەنێ، ئێمەیش شیرمان خوارد، کاتێ کە گەڕایەوە پێمانوت: ئایە تۆ نوشتە کردن دەزانی یان نوشتە کەری؟ وتی: نەخەێر نوشتەم نەکردوە بە دایکی کتێب نەبێت، واتە بە فاتیحە نەبێ، وتمان: هیچ شتێك مەڵێن تا دەچینەوەو پرسیار لە پێغەمبەری خودا(ﷺ) دەکەین، کاتێ کە چوین بۆ مەدینە باسمان کرد بۆ پێغەمبەر(ﷺ) فەرمووی: ئەو چۆنی زانی کە فاتیحە نوشتەیە. دابەشی کەن و بەشێکی بۆ منیش دانێن[٤]. فەرمودەیەکی تر، مەسلیم لە سەحیحەکەیدا و نەسائیش لە سونەنەکەیدا ڕیوایەتیان کردوە لە ئیبنو عەباسەوە ئەڵێت: کاتێك کەلەلای پێغەمبەری خودا بووین(ﷺ)جوبرە ئیلی لەلا بو، کاتێ کە گوێی لە دەنگێ بوو لەسەریەوە، جوبرەئیل چاوی هەڵبڕی بۆ ئاسمان و وتی: ئەوە دەرگایەك بو لە ئاسمانەوە کرایەوە، کە هەرگیز نەکراوەتەوە، وتی: فریشتەیەکی لێوە دابەزی و هات بۆ لای پێغەمبەر(ﷺ) وتی: مژدە بێت لێت کە دوو ڕوناکیت پێدراوە بە هیچ کەسێ لە پێش تۆدا نەدراوە، فاتیحەی ئەم قورئانەو کۆتاییەکانی سورەتی بەقەرە. هیچ پیتێك لەو دوانەت نەخوێندوەتەوە مەگین پێت بەخشراوە. ئەمە وتەی نەسائی و مەسلیمیشە بەم شێوەیە[٥].

## خوێندنی فاتیحە لە نوێژدا

فەرمودەیەکی تر،موسلیم ڕیوایەتی کردوە لە ئەبو هورەیرەوە ڕەزای خوای لێبێت لە پێغەمبەرەوە(ﷺ) فەرمویەتی: هەرکەسێ نوێژێ بکات و دایکی قورئانی تیا نەخوێنێ ئەو نوێژە تەواو نیە سێ جار فەرموی وترا بە ئەبو هورەیرە: ئێمە لە دوای ئیمامەوە دەبین وتی: لە دڵی خۆتا بیخوێنە،چونکە من لە پێغەمبەری خودام بیستوە(ﷺ) ئەی فەرموو: خودای گەورە فەرمویەتی: نوێژم دابەش کردوە لە نێوان خۆم و بەندەکانما کردوومە بە دوو بەشەوە ئەمە تایبەتە بە بەندەکەم هەرچیش داوا بکا بۆی دەکەم کاتێك ئەڵێت: ﴿ٱلۡحَمۡدُ لِلَّهِ رَبِّ ٱلۡعَٰلَمِينَ﴾ خودای گەورە ئەفەرموێت:

---

[١] أحمد /٢١١/٤ ص١٦. سەحیحة.

[٢] فتح الباری/٨/٦/٦٧١.

[٣] أبو داود/٢/١٥٠/، النسائی/٢/١٣٩/، أبی ماجة/٢/١٢٤٤/سەحیحە.

[٤] فتح الباری/٨/٦٧١.

[٥] مسلم/١/٥٥٤/النسائی فی الکبری/٥/١٢.

بەندەکەم سوپاسی کردم. وەکاتێك ئەڵێت: ﴿ٱلرَّحۡمَٰنِ ٱلرَّحِيمِ﴾ خودای گەورە ئەفەرموێت: بەندەکەم ستایشی کردم. وە کاتێك ئەڵێت: ﴿مَٰلِكِ يَوۡمِ ٱلدِّينِ﴾ خودای گەورەئەفەرموێت: بەندەکەم ڕێزی لێ گرتم. وەجارێکی تر فەرمویەتی بەندەکەم سەرپشکی کردووم. وەکاتێك ئەڵێت: ﴿إِيَّاكَ نَعۡبُدُ وَإِيَّاكَ نَسۡتَعِينُ﴾ ئەفورمێت: ئەمە لە نێوان من و بەندەکەمدایە، بۆ بەندەکەم هەیە کە داوای کردوە. وەکاتێك ئەڵێت: ﴿ٱهۡدِنَا ٱلصِّرَٰطَ ٱلۡمُسۡتَقِيمَ ۞ صِرَٰطَ ٱلَّذِينَ أَنۡعَمۡتَ عَلَيۡهِمۡ غَيۡرِ ٱلۡمَغۡضُوبِ عَلَيۡهِمۡ وَلَا ٱلضَّآلِّينَ﴾ خودای گەورە ئەفەرموێت: ئەمە تایبەتە بە بەندەکەم هەرچی داوا بکا بۆی ئەکەم. هەروایش نەسائی ڕیوایەتی کردوە. وە لە وتەیەکی تریشدا لە نەسائی و موسلیمەوە ڕیوایەت کراوە نیوەی بۆ منەو نیوەیشی بۆ بەندەکەمە. ئەمە تایبەتە بە بەندەکەموو هەرچیش داوا بکا بۆی دەکەم[1].

## ئەو شتانەی پەیوەندی بەم فەرمودەیەو بە سورەتی فاتیحەوە هەیە لە چەند ڕویەکەوە

سوورەتی فاتیحە بەناوی نوێژیشەوە ناوی هاتوەمەبەست پێی خوێندنەوەیەتی وەك ئەم ئایەتە کە خودای گەورە ئەفەرموێت: ﴿قُلِ ٱدۡعُواْ ٱللَّهَ أَوِ ٱدۡعُواْ ٱلرَّحۡمَٰنَۖ أَيّٗا مَّا تَدۡعُواْ فَلَهُ ٱلۡأَسۡمَآءُ ٱلۡحُسۡنَىٰۚ وَلَا تَجۡهَرۡ بِصَلَاتِكَ وَلَا تُخَافِتۡ بِهَا وَٱبۡتَغِ بَيۡنَ ذَٰلِكَ سَبِيلٗا﴾[2]. لە نوێژ کردنتا دەنگ بەرز مەکەرەوە، بەنەهێنیش مەیکە،لەو نێوانەدا ڕێگایەك هەڵبژێرە (بصلاتك) مەبەست پێی خوێندنەوەیەتی. وەك لە فەرمودەی سەحیحدا هاتوە لە ئیبنو عەباسەوە. لەم فەرمودەیەشا هەروا هاتوە: نوێژم دابەش کردوە لە نێوان خۆم و بەندەکانما بە دوو بەشەوە، نیوەی بۆ منەو نیوەیشی بۆ بەندەکەم ئەمە تایبەتە بەبەندەکەم داوای چیش بکا بۆی دەکەم[3]. پاشان ئەو دابەش کردنەی بە درێژی ڕوونکردوەتەوە لە خوێندنەوەی سورەتی فاتیحەدا لە نوێژدا. وە لە گەورەترین پایەکانیەتی. کاتێ کەناوی عیبادەت برا، سورەتی فاتیحە بەشێکە لە بەشەکان، وە مەبەست پێی خوێندنی سورەتی فاتیحەیە. وەك چۆن وتەی خوێندنەوە بەکار هێنراوەو مەبەست پێی نوێژ بووە. وەك خودای گەورە ئەفەرموێت: ﴿أَقِمِ ٱلصَّلَوٰةَ لِدُلُوكِ ٱلشَّمۡسِ إِلَىٰ غَسَقِ ٱلَّيۡلِ وَقُرۡءَانَ ٱلۡفَجۡرِۖ إِنَّ قُرۡءَانَ ٱلۡفَجۡرِ كَانَ مَشۡهُودٗا﴾[4]. نوێژی بەیانی بەجێ بهێنە بەڕستی قورئان خوێندنی نوێژی بەیانی هەمیشە دەبینرێت لەلایەن فریشتەکانی شەوو ڕۆژەوە

---

[1] مسلم/١/٢٩٦/النسائی فی الكبرا/٥/١١/١٢ ص١٦

[2] الاسراء ١١٠.

[3] الفتح الباری/٨/٢٥٧ ص١٧.

[4] الاسراء ٧٨.

مەبەست پێی نوێژی بەیانیە. وەك لە هەردوو سەحیحەكەدا ئاماژەی پێ كراوە كە: فریشتەكانی شەوو فریشتەكانی ڕۆژ ئامادەی دەبن و ئاگایان لێیەتی[1].

## پێویستی خوێندنی فاتیحە لە گشت نوێژەكاندا بە پێش نوێژی بێت یان لە دوای پێش نوێژەوە یان بە تەنیا بكرێت

ئەو فەرمودانەی كە باسمان كرد هەموو بەڵگەن لەسەر ئەوە كە دەبێ فاتیحە لە نوێژدا بخوێنرێ، زۆرێك لە زانایان هاودەنگن لەسەری. ئەو فەرمودەی كە باس كرا كە پێغەمبەری خودا(ﷺ) فەرموی: هەركەسێ نوێژی كردو فاتیحەی تیا نەخوێند، نوێژەكەی ناتەواوە[2]. الخراج یانی: نوێژەكەی تەواو نیە، وەك لە فەرمودەكەدا مانای كردوە. دیسان لەهەردوو سەحیحەكەدا هاتووەلە عوبادەی كوڕی سامیتەوە ئەڵێت: پێغەمبەری خودا(ﷺ) فەرمویەتی: نوێژی نەكردوە كەسێ كە فاتیحە نەخوێنێ[3]. وە لەهەردوو سەحیحەكەی ئیبنو خوزەیمەو ئیبنو حباندا هاتووە لە ئەبو هورەیرەوە ڕەزای خوای لێبێت ئەڵێت: پێغەمبەری خودا(ﷺ) ئەفەرموێت: هیچ نوێژێ دروست و تەواو نییە كە دایكی قورئانی (فاتیحەی) تیا نەخوێنرێ[4]. فەرمودە لەم بارەیەوە زۆرە كە پێویستە لەسەر نوێژ خوێن كە سورەتی فاتیحە بخوێنێ پێش نوێژ بێت یان لە دوای پێش نوێژەوە بێت یان خۆی تەنیا بێت لە هەمو نوێژەكانداو لە هەمو ڕكاتێكدا.

## تەفسیری هانا بردن بە خوداو-الاستعاذة-حوكمەكانی

خودای گەورە ئەفەرموێت: ﴿خُذِ ٱلْعَفْوَ وَأْمُرْ بِٱلْعُرْفِ وَأَعْرِضْ عَنِ ٱلْجَٰهِلِينَ ﴿١٩٩﴾ وَإِمَّا يَنزَغَنَّكَ مِنَ ٱلشَّيْطَٰنِ نَزْغٌ فَٱسْتَعِذْ بِٱللَّهِ ۚ إِنَّهُۥ سَمِيعٌ عَلِيمٌ﴾[5]. چاو بپۆشەو فەرمان بە كاری چاك بدەو لەو نەزانانە واز بهێنە، هەركاتێكیش خەیاڵاتێكی خراپت لە شەیتانەوە تووش هات هەر پەنا بە خوا بەرە، كە خۆی بیسەرو زانایە. وەئەفەرموێت: ﴿ٱدْفَعْ بِٱلَّتِى هِىَ أَحْسَنُ ٱلسَّيِّئَةَ ۚ نَحْنُ أَعْلَمُ بِمَا يَصِفُونَ ﴿٩٦﴾ وَقُل رَّبِّ أَعُوذُ بِكَ مِنْ هَمَزَٰتِ ٱلشَّيَٰطِينِ ﴿٩٧﴾ وَأَعُوذُ بِكَ رَبِّ أَن يَحْضُرُونِ﴾[6]. تۆ وەڵامی خراپە بە چاكە بدە، ئێمە باشتر دەزانین ئەوانە چی دەڵێن. تۆ بڵێ: ئەی پەروەردگارم! هانام بە تۆ لە دنەدانی شەیتانەكان. هەر

---

[1] فتح الباری/٨/٢٥١/مسلم/١/٤٣٩ ص١٧.

[2] أحمد/٢/٢٥٠ سەحیحە.

[3] فتح الباری/٢/٢٧٦/مسلم/١/٢٩٥.

[4] إبن خزیمة/١/٢٤٨/ابن حبان/٣/١٣٩/سەحیحە.

[5] الاعراف ١٩٩–٢٠٠.

[6] المؤمینون ٩٦–٩٨.

ماناش دەبەم بەر تۆ،کە ئەوان دێن بەلامەوە، وە ئەفەرموێت: ﴿وَلَا تَسْتَوِى الْحَسَنَةُ وَلَا السَّيِّئَةُ ادْفَعْ بِالَّتِى هِىَ أَحْسَنُ فَإِذَا الَّذِى بَيْنَكَ وَبَيْنَهُ عَدَاوَةٌ كَأَنَّهُ وَلِىٌّ حَمِيمٌ ﴿٣٤﴾ وَمَا يُلَقَّاهَا إِلَّا الَّذِينَ صَبَرُوا وَمَا يُلَقَّاهَا إِلَّا ذُو حَظٍّ عَظِيمٍ ﴿٣٥﴾ وَإِمَّا يَنزَغَنَّكَ مِنَ الشَّيْطَانِ نَزْغٌ فَاسْتَعِذْ بِاللَّهِ إِنَّهُ هُوَ السَّمِيعُ الْعَلِيمُ﴾[1] چاکەو خراپە وەك یەك نین، تۆ هەمیشە وەڵامی چاکتر بدەرەوە، ئەوسا کەسێ لەگەڵ تۆدا دوژمنە دەبێتە دۆستی نزیکت. ئەم کارەش هەر توش کەسانێ دەبێ کە بتوانن خۆڕاگر بن، هەرکەسیش ئەو کارەی توش بێت، دیارە زۆر بەختەوەرە. هەرکاتێ لە شەیتانەوە توشی خەیالاتێ بوی، خێرا پەنا بە خوا بەرە کە خۆی بیسەرو زانایە. ئەو سێ ئایەتە کە چوارەمی نیە لەم مانایە کە خودای گەورە فەرمان دەکا بە بەتەنگەوە چونی و یارمەتی دانی دوژمنی ئادەمی و چاکە لەگەڵ کردنی تا ئەی گێڕێتەوە سەر سروشتە پاکەکەی خۆی کە دۆستایەتی و دڵپاکیە. وە فەرمانیشی کردوە بە پەنا گرتن بە خودا لە دوژمنی شەیتانەکان. چونکە شەیتان بە تەنگەوە چون و چاکە نازانێ و قبوڵی ناکات. هەر لەناو چونی نەوەی ئادەمی دێت. لەبەر ئەوە کە دوژمنایەتیەکی زۆر بەهێز لە نێوان ئەو و باوکیاندا ئادەم هەبووە لە پێشا. وەك خودای گەورە ئەفەرموێت: ﴿يَا بَنِى آدَمَ لَا يَفْتِنَنَّكُمُ الشَّيْطَانُ كَمَا أَخْرَجَ أَبَوَيْكُم مِّنَ الْجَنَّةِ يَنزِعُ عَنْهُمَا لِبَاسَهُمَا لِيُرِيَهُمَا سَوْآتِهِمَا إِنَّهُ يَرَاكُمْ هُوَ وَقَبِيلُهُ مِنْ حَيْثُ لَا تَرَوْنَهُمْ إِنَّا جَعَلْنَا الشَّيَاطِينَ أَوْلِيَاءَ لِلَّذِينَ لَا يُؤْمِنُونَ﴾[2]. ئەی نەوەکانی ئادەم! شەیتان نەتانخەڵەتێنێ، هەروەك دایك و باوکتانی لە بەهەشت دەرکردن. وە ئەفەرموێت: ﴿إِنَّ الشَّيْطَانَ لَكُمْ عَدُوٌّ فَاتَّخِذُوهُ عَدُوًّا إِنَّمَا يَدْعُوا حِزْبَهُ لِيَكُونُوا مِنْ أَصْحَابِ السَّعِيرِ﴾[3] شەیتان دوژمنی ئێوەیە،سا ئێوەش ببنە دوژمنی،ئەو هەر بۆیە دارو دەستەی بانگ دەکا،تا لەیارانی ئاگر بن. وە ئەفەرموێت: ﴿وَإِذْ قُلْنَا لِلْمَلَائِكَةِ اسْجُدُوا لِآدَمَ فَسَجَدُوا إِلَّا إِبْلِيسَ كَانَ مِنَ الْجِنِّ فَفَسَقَ عَنْ أَمْرِ رَبِّهِ أَفَتَتَّخِذُونَهُ وَذُرِّيَّتَهُ أَوْلِيَاءَ مِن دُونِى وَهُمْ لَكُمْ عَدُوٌّ بِئْسَ لِلظَّالِمِينَ بَدَلًا﴾[4] ئایە ئێوە جگە لە من کە بە ئاشکرا دوژمنتانم؟ ئای چ گۆڕانەوەیەکی خراپە گوێڕایەڵی کردنی ناهەقی کاران بۆ شەیتان. شەیتان سوێندی خوارد بۆ باوکمان ئادەم سەلامی خوای لێبێ تەنیا ئەو مەبەستی ئامۆژگاریەو هیچی تریەلام درۆی کرد. چۆن لە گەڵمان جولایەوە، خودای گەورە ئەفەرموێت: ﴿قَالَ فَبِعِزَّتِكَ لَأُغْوِيَنَّهُمْ أَجْمَعِينَ ﴿٨٢﴾

---

[1] فصلت ٣٤-٣٦.

[2] الاعراف ٢٧.

[3] فاطر ٦.

[4] الكهف ٥٠.

﴿ إِلَّا عِبَادَكَ مِنْهُمُ ٱلْمُخْلَصِينَ ﴾[1]. وتی: دەسا سوێند بە دەسەلاتی تۆ سەر لەبەریان گومڕا دەکەم، مەگین ئەوانەی بە پاکی دەت پەرستن. وە ئەفەرموێت: ﴿ فَإِذَا قَرَأْتَ ٱلْقُرْءَانَ فَٱسْتَعِذْ بِٱللَّهِ مِنَ ٱلشَّيْطَٰنِ ٱلرَّجِيمِ ﴿٩٨﴾ إِنَّهُۥ لَيْسَ لَهُۥ سُلْطَٰنٌ عَلَى ٱلَّذِينَ ءَامَنُوا۟ وَعَلَىٰ رَبِّهِمْ يَتَوَكَّلُونَ ﴿٩٩﴾ إِنَّمَا سُلْطَٰنُهُۥ عَلَى ٱلَّذِينَ يَتَوَلَّوْنَهُۥ وَٱلَّذِينَ هُم بِهِۦ مُشْرِكُونَ ﴾[2] کاتێ قورئان دەخوێنی هەر پەنا بە خودا بەرە لە شەیتانی ترۆ کراو،ئەو هیچ زۆرێکی نیە بەسەر ئەوانەوە کە خاوەنباوەڕن خۆیان بە پەروەردگاریان سپاردوە، ئەو هەر بەسەر ئەوانەدا دەستی دەڕوا، کە خۆیان کردوەتە دۆستی و شەریك بۆ خودا دادەنێن.

## پەنا بردن بە خودا پێش قورئان خوێندن

خودای گەورە ئەفەرموێت: ﴿ فَإِذَا قَرَأْتَ ٱلْقُرْءَانَ فَٱسْتَعِذْ بِٱللَّهِ مِنَ ٱلشَّيْطَٰنِ ٱلرَّجِيمِ ﴾[3] کاتێ قورئان دەخوێنی هەر پەنا بە خودا بەرە لە شەیتانی ترۆ کراو. واتە: کاتێ ویستت قورئان بخوێنیت. وەك ئەم ئایەتەش کە خودای گەورە ئەفەرموێت: ﴿إِذَا قُمْتُمْ إِلَى ٱلصَّلَوٰةِ فَٱغْسِلُوا۟ وُجُوهَكُمْ وَأَيْدِيَكُمْ ﴾. ئەگەر هەڵسان بۆ نوێژ کردن دەم و چاو و دەستەکانتان بشۆن، واتە: ئەگەر ویستان هەڵسن بۆ نوێژ دەم و چاو و دەستەکانتان بشۆن،بەڵگەیش لەسەر ئەمە ئەو فەرمودانەیە کە پێغەمبەری خودا فەرمویەتی لە بارایەوە. ئیمامی ئەحمەد ڕیوایەتی کردوە لە ئەبو سەعیدی خودەریەوە،وتی: پێغەمبەری خودا(ﷺ) کاتێ کە هەڵدەستا بۆ شەو نوێژو دەستی دەکرد بە نوێژ الله أکبری دەکرد ئەیفەرمو: ئەی خودایە پاك و بێعەیبی و ستایش هەر بۆتۆیە. مەزنە ناوت و زۆر گەورەی، جگە لە تۆ هیچ شتێ بۆ پەرستن ناشێ،پاشان سێ (جار لا إله إلا الله) ی دەکردو پاشان ئەی فەرمو: پەنا دەگرم بە خودای بیسەرو زانا لە شەیتانی ترۆ کراو لە دنە دان و فوتێکردن و فوکردنی[4]. خاوەنی هەر چوار سونەنەکە ڕیوایەتیان کردوە تیرمزی ئەڵێت: ئەمە بەناوبانگ ترین شتە لەم بەشەدا(الباب–تفسیری–النهز) بە مرادن وکە خنکاندنە وە –النفخ– بە خۆ بەزل زانی و –النفق– بە شیعرو دەمەتەقێ کردوە. وەك ئەبو داودو ئیبنو ماجە ڕیوایەتیان کردوە لە جوبەیری کوڕی موتعیم وە لە باوکیەوە،وتی: پێغەمبەری خودام بینی کاتێ کە چووە ناو نوێژەوە فەرموی: ( الله أکبر کبیرا سێ جار، والحمد الله کثیرا سێ جار، سبحان الله بکرة و أصیلا سێ جار،)ئەی خودایە! پەنات پێدەگرم لە شەیتانی ترۆکراولە تێوەژندەنی و لە

---

[1] ص ٨٢–٨٣.

[2] النحل ٩٨–١٠٠.

[3] النحل ٩٨.

[4] أحمد/٣/٦٩/ابو داود/١/٤٩٠/تحفة الاحوذي/٢/٤٧/ابن ماجة/١/٢٦٤/ص١٨ فەرمودەیەکی سەحیحە.

فوتێکردنی وکەش و فشی لە فوکردن و دەمەتەقێی. عەمر وتی: (همزه) خنکاندنی مونفخه خۆ بەزلزانی و(ونفثه) لەشیعری[1]. ئیبنو ماجه وتی: ئیبنو مونزیر بۆی باس کردین: ئیبنو فوزەیل بۆی باس کردین عەتای کوڕی سائیب بۆی باس کردین لە عەبدورەحمانی سولەیمەوە لە ئیبنو مەسعودەوە لەپێغەمبەرەوە(ﷺ) فەرمووی: ئەی خودایە پەنات پێدەگرم لە شەیتانی تڕۆ کراو لە تێوەژندنی و خۆ بەزل زانی و شیعرو دەمەتەقێی[2].

## پەنا گرتن بە خودا لە کاتی توڕەییدا

حافیز ئەبو یەعلا ئەحمەدی کوڕی عەلی کوڕی موسەنای موسڵی لە موسنەدەکەیدا ڕیوایەتی کردوە،لە ئوبەیی کوڕی کەعبەوە ڕەزای خوای لێبێت وتی: دوو پیاو تێك هەڵچون لە لای پێغەمبەردا(ﷺ) لە تورەیدا لوتی یەکێکیان کرایەوە -تمزع- پێغەمبەری خودا(ﷺ) فەرموی: من شتێك دەزانم ئەگەر بیڵێ ئەوەی توشی هاتوە دەڕوات. أعوذ بالله من الشیطن الرجیم پەنا دەگرم بە خودا لە شەیتانی تڕۆ کراو[3]. نەسایش ڕیوایەتی کردوە لە الیوم و اللیله دا. بوخاری ڕیوایەتی کردوە لە سولەیمانی کوڕی سورەدەوە ڕەزای خوای لێبێ وتی: دوو پیاو قسەیان بە یەکتری دەگوت لە لای پێغەمبەردا(ﷺ) ئێمەش لەلای دانیشتبوین،یەکێکیان قسەی بە هاوەڵەی دەوت وتوڕە بوبو ڕەنگی سور هەڵگەڕابو پێغەمبەر(ﷺ) فەرموی: بەڕاستی من وتەیەك شارەزام ئەگەر بیوتایە ئەوەی بەسەریا هاتوە نەیدەماو لادەچو ئەگەر بیوتایە پەنا دەگرم بە خودا لە شەیتانی تڕۆ کراو[4]. وتیان بە پیاوەکە: ئایە گوێت لێ نیە کە پێغەمبەری خودا(ﷺ) چی فەرموو؟پیاوەکە وتی: خۆ من شێت نیم، موسلیم و ئەبو داودو نەسائیش ڕیوایەتیان کردوە لەگەڵی. فەرمودەی زۆر دەربارەی پەناگرتن بە خودا زۆر درێژە دەکێشێ باسکردنی لێرەدا شوێنەکەی لە کتێبی الاذکار و فضائل الاعمال دایە وألله أعلم.

## پەناگرتن بە خودا-الاستعاذة-واجبە یان موستەحەبە

مەسەلەیەك: زانایان کۆدەنگن لەسەر ئەوە کە پەنا گرتن بە خودا موستەحەبە فەرز نیە، ئەوەی نایخوێنێ گوناهبار نابێ،ڕازی گێڕاویەتیەوە لە عەتای کوڕی ئەبو ڕیباحەوەلە پەناگرتن بە خوا لە نوێژو لەدەرەوەی نوێژیشا بۆ کەسێ ویستی قورئان بخوێنێ واجبە،ڕازی زاهیری ئەم ئایەتەی کردوەتە بەلگە(فأستعذ) واتە: پنابگرن. ئەمە فەرمانێکی ئاشکرایە لەسەر واجبی و بەردەوامی پێغەمبەریش(ﷺ) لەسەری، چونکە شەڕی شەیتان دوردەخاتەوە،هەر شتێکیش بەو نەبێ واجب تەواو

---

[1] ابو داود/١/٤٨٦/ابن ماجة/٢٦٥.

[2] ابن ماجة/١/٢٦٦/ص١٨حەسەنە.

[3] النسائی فی الکبرا/١٠٢٣٣ حەسەنە.

[4] فتح الباری/٦/٣٨٨/مسلم/٤/٢٠١٥/أبو داود/٥/١٤٠/النسائی فی الکبرا/٦/١٠٤.

نەبێ، ئەو شتەش واجبە، چونکە پەناگرتن بە خودا پارێزگاریە. کاتێ ئەو کەسە وتی: پەنا دەگرێ بە خوداو وتی: (أعوذ بالله من الشيطان الرجيم) پەنا دەگرم لە شەیتانی ترۆ کراو. ئەوی بەسە.

## لە چاکی و قەشەنگی پەناگرتن

لە چاکیەکانی پەنا گرتن بەخودا، دەم پاك و خاوێن دەکاتەوە لەو شتانەی کەوتویەتی لە قسەی بێکەلك و خراپ و خاوێن دەبێتەوە. بە تایبەتی بۆ خوێندنی قورئانی پیرۆزکەپەناگرتنە بە خوداو داوای یارمەتی لێی و داننانە بەتواناو دەسەلاتی خودای گەورەدا لاوازی عەبدو بێ دەسەلاتی دەردەخات،بەرامبەر ئەو دوژمنە ئاشکرایە کە خۆی پەنا داوەو نادیارە. کە هەرگیز ڕێکەوتن قبولێ ناکا و بە چاکەکردن مامەڵەی لەگەڵدا ناکرێ بە پێچەوانی دوژمنی مرۆڤەوە. وەك چەند ئایەت لەو بارەیەوە هاتوە، خودای گەورە ئەفەرموێت: ﴿ إِنَّ عِبَادِي لَيْسَ لَكَ عَلَيْهِمْ سُلْطَانٌ وَكَفَىٰ بِرَبِّكَ وَكِيلًا ﴾[١]. تۆ بەسەر بەندەکانی مندا هیچ دەسەلاتێکت نیە، پەروەردگارت بریکاریانەو بەسیانە،خودای گەورەفریشتەی ناردە خوارەوە بۆشەڕکردن دژی دوژمنی مرۆیی،هەرکەسێ دوژمنی ئاشکرای مرۆڤی کوشت شەهید بو، وە ئەوەی دوژمنی ناوەوە کوشتویەتی دەربەدەر بوەو لەناو چووە. وە ئەوەی دوژمنی ئاشکرا زاڵ بووە بەسەریدا پاداشتی بۆ دانراوە بەڵام ئەوەی دوژمنی ناوەوە تێکی شکاندوە سەری لێشێواوەو تاوان بارە، لەبەر ئەوە کە شەیتان مرۆڤ دەبینێ و مرۆڤ ئەو نابینێ پەنای پێدەگرێ لەو خودایە لێی کەچاوی لێیەتی و شەیتان ئەو نابینێ. الاستعاذة بریتیە لە پەنابردن بە خودای گەورە و خۆ سپاردن پێی لەشەڕی گشت شەڕخوازێ. پەنا گرتنیش بۆ دەرپەڕاندن و دەرکردنی شەڕە. خۆ سپاردنیش بۆ داواکردنی وەدەس هێنانی چاکەیە.

## مانای پەنا گرتن بە خودا -الاستعاذة-

مانای (أعوذ بالله من الشيطان الرجيم) یانی: من خۆم دەسپێرم بە خودا لە شەیتانی ترۆ کراو کە توشی زیانم بکا لە دینمدا یان لە دونیامداو ببێتە لەمپەر لە هەڵسانم بەو کارانەی فەرمانم پێکراوە بیکەم یان دنەم بدا لەسەر کارێ کە لێم قەدەغە کراوە. چونکە شەیتان هیچ ناگێڕێتەوە لە مرۆڤ جگە لە خودا، هەر بۆیە خودای گەورە فەرمانی داوە ڕێکەوتن و دانانی چارەسەر لەگەڵ شەیتانی مرۆڤ و چاکە کردن دەربارەی بۆ ئەوەی بەڵکو ئەو سروشتە خراپەی هەیەتی بیگۆڕێ. وە فەرمانیشی داوە بە پەنا گرتن لە شەیتانی جنۆکە،چونکە ئەم بەرتیل وەرناگرێ،چاکەیش هیچ سودێکی نیە لەگەڵی،چونکە شەیتان هەر بەسروشت خراپەکارە. ناتپارێزێ لێی جگە لەو کەسەی کە دروستی کردوە. ئەم مانایەش لە سێ ئایەتا لە قورئانا هاتوەچوارەمی نیە. خودای گەورە ئەفەرموێت: ﴿ خُذِ الْعَفْوَ وَأْمُرْ بِالْعُرْفِ وَأَعْرِضْ

---

[١] الاسراء ٦٥.

عَنِ ٱلْجَٰهِلِينَ ﴾[1] چاو بپۆشەو فەرمان بە كاری چاك بدەو واز لەو نەزانانە بێنە ئەم ئایەتە پەیوەندی بە هەڵسوكەوتەوەیە دەربارەی دوژمنی مرۆیی. پاشان ئەفەرموێت: ﴿ وَإِمَّا يَنزَغَنَّكَ مِنَ ٱلشَّيْطَٰنِ نَزْغٌ فَٱسْتَعِذْ بِٱللَّهِ إِنَّهُۥ سَمِيعٌ عَلِيمٌ ﴾[2] هەركاتیّ خەیاڵاتێكی خراپت لە شەیتان بە لادا هات هەر پەنا بە خودا بەرە،كە خۆی بیسەرو زانایە. لە سورەتی موئمینون دا ئەفەرموێت: ﴿ ٱدْفَعْ بِٱلَّتِى هِىَ أَحْسَنُ ٱلسَّيِّئَةَ نَحْنُ أَعْلَمُ بِمَا يَصِفُونَ ﴿٩٦﴾ وَقُل رَّبِّ أَعُوذُ بِكَ مِنْ هَمَزَٰتِ ٱلشَّيَٰطِينِ ﴿٩٧﴾ وَأَعُوذُ بِكَ رَبِّ أَن يَحْضُرُونِ ﴾[3] تۆ وەڵامی خراپە بە چاكە بدە، ئێمە باشتر دەزانین ئەوان چی دەڵێن. تۆ بڵیّ ئەی پەروەردگارم! هانام بە تۆ لە دنەدانی شەیتانەكان. هەر هاناش دەبەمە بەر تۆ،كە ئەوان دێن بەلامەوە. وە لە سورەتی حامیمی سەجدە دا ئەفەرموێت: ﴿ وَلَا تَسْتَوِى ٱلْحَسَنَةُ وَلَا ٱلسَّيِّئَةُ ٱدْفَعْ بِٱلَّتِى هِىَ أَحْسَنُ فَإِذَا ٱلَّذِى بَيْنَكَ وَبَيْنَهُۥ عَدَٰوَةٌ كَأَنَّهُۥ وَلِىٌّ حَمِيمٌ ﴿٣٤﴾ وَمَا يُلَقَّىٰهَآ إِلَّا ٱلَّذِينَ صَبَرُوا۟ وَمَا يُلَقَّىٰهَآ إِلَّا ذُو حَظٍّ عَظِيمٍ ﴿٣٥﴾ وَإِمَّا يَنزَغَنَّكَ مِنَ ٱلشَّيْطَٰنِ نَزْغٌ فَٱسْتَعِذْ بِٱللَّهِ إِنَّهُۥ هُوَ ٱلسَّمِيعُ ٱلْعَلِيمُ ﴾[4] چاكەو خراپە وەك یەك نین،تۆ هەمیشە وەڵامی چاكتر بدەرەوە،ئەوسا كەسیّ كەلەگەڵ تۆ دوژمنە،دەبێتە دۆستی نزیكت. ئەم كارەیش هەر توشی كەسانیّ دەبیّ كە بتوانن خۆڕاگر بن. هەركەسیش ئەو كارەی توش بێت،دیارە زۆر بەختەوەرە. هەروەختیّ لە شەیتانەوە دوچاری خەیاڵاتیّ بووی، گورج پەنا بەخودا بەرە كە خۆی بیسەرو زانایە.

## ناولێنانی شەیتان

شەیتان لە زمانی عەرەبیدا لە (شطن) وە دەرهێنراوە ئەگەر دورکەوتەوە، چونكە شەیتان بە سروشتی خۆی دورە لە سروشتی مرۆڤەوە: بەلادانیش دورە لە هەموچاكەیەكەوە. وتراویشە دەرهێنراویشە لە (شاط) چونكە لە ئاگر دروست كراوە،هەندێكی تریش دەڵێن: هەردوكیان لە ماناداراستن،بەلاّم یەكەم ڕاسترە. سیبەوەیهی ئەڵێت: عەرەب دەڵێن: (تشیطن) فلانە كەس، كاتیّ كە هەڵسا بەكارە شەیتانیەكان. خۆ ئەگەر لە (شاط) بوایە دەیان گوت: (تشیط) كەواتە شەیتان لە ڕاستیدا لە دورەوە دەرهێنراوە. هەربۆیە هەرشتیّ یاخی ببیّ لە جنۆكەو مرۆڤ و گیانەوەر ناوی شەیتانی لێدەنێن. خودای گەورە ئەفەرموێت: ﴿ وَكَذَٰلِكَ جَعَلْنَا لِكُلِّ نَبِىٍّ عَدُوًّا شَيَٰطِينَ ٱلْإِنسِ وَٱلْجِنِّ يُوحِى بَعْضُهُمْ إِلَىٰ بَعْضٍ

---

[1] الاعراف ١٩٩.

[2] الاعراف ٢٠٠.

[3] المؤمنون ٩٦-٩٨.

[4] فصلت ٣٤-٣٦.

زُخْرُفَ ٱلْقَوْلِ غُرُورًا وَلَوْ شَآءَ رَبُّكَ مَا فَعَلُوهُ فَذَرْهُمْ وَمَا يَفْتَرُونَ﴾[1]، ئێمە هەر پێغەمبەرێك دوژمنێکمان لەنێو شەیتانەکانی بنیادەم و جنۆکەدانا. هەندێك لەوان بە فریودان قسەی ڕازاوەو درۆیان بۆ هەندێك ڕادەگەیاند وە لە موسنەدی ئیمامی ئەحمەدا هاتوە لە ئەبو زەڕەوە ڕەزای خوای لێبێتەلێت: پێغەمبەری خودا(ﷺ) ئەفەرموێت: (ئەی ئەبو زەڕ پەنا بگرە بە خودا لە شەیتانی مرۆڤ و جنۆکە،وتم ئایا مرۆڤیش شەیتانی هەیە، وتی: بەڵێ[2]. وە لە سەحیحی موسلیمیشدا هاتوە هەر لە ئەبو زەڕەوە ئەڵێت: پێغەمبەری خودا(ﷺ) ئەفەرموێت: ئافرەت و گوێدرێژو سەگی ڕەش نوێژ دەبڕێت، وتم: ئەی پێغەمبەری خودا(ﷺ) (مابال) جیاوازی سەگی ڕەش لە سەگی سورو زەرد چییە؟ فەرموی: سەگی ڕەش شەیتانە[3]. ئیبنو جەریر ڕیوایەتی کردوەلە عومەری کوڕی خەتابەوە ڕەزای خوای لێبێت سواری بارگێرێك بوو لەنجەو لاری دەکرد ئەویش لێی ئەدا، ئەڵام لەنجەو لارەکەی زیاتر دەبوو،دابەزی لێی وتی: ئێوە لەسەرشەیتانێ نەبێ منتان سوار نەکردوە، لێی دابەزیم تا خۆیشم لە بیر کردبو) سەنەدەکانی سەحیحە[4].

**مانای ڕەجیم**

(الرجیم) لەسەر وەزنی –فعیل– ی بەمانای –مفعول–ە واتە: نەفرین لێکراو ترۆکراو بێبەش کراو لە هەموو چاکەیەك. وەك خودای گەورە ئەفەرموێت: ﴿وَلَقَدْ زَيَّنَّا ٱلسَّمَآءَ ٱلدُّنْيَا بِمَصَٰبِيحَ وَجَعَلْنَٰهَا رُجُومًا لِّلشَّيَٰطِينِ وَأَعْتَدْنَا لَهُمْ عَذَابَ ٱلسَّعِيرِ﴾[5]. ئێمە ئاسمانی دنیامان بە زۆر چرا ڕازاندۆتەوە. کردیشمانن بە کەرەستەی ڕاوەدونانی شەیتانەکان. وە ئەفەرموێت: ﴿إِنَّا زَيَّنَّا ٱلسَّمَآءَ ٱلدُّنْيَا بِزِينَةٍ ٱلْكَوَاكِبِ ﴿٦﴾ وَحِفْظًا مِّن كُلِّ شَيْطَٰنٍ مَّارِدٍ ﴿٧﴾ لَّا يَسَّمَّعُونَ إِلَى ٱلْمَلَإِ ٱلْأَعْلَىٰ وَيُقْذَفُونَ مِن كُلِّ جَانِبٍ ﴿٨﴾ دُحُورًا وَلَهُمْ عَذَابٌ وَاصِبٌ ﴿٩﴾ إِلَّا مَنْ خَطِفَ ٱلْخَطْفَةَ فَأَتْبَعَهُۥ شِهَابٌ ثَاقِبٌ﴾[6]، ئێمە ئاسمانی دنیامان بە ئەستێرەکان ڕازاندوەوە،لە گشت شەیتانی نافەرمانیشمان پاراست، ئیتر لە باڵانشینان گوێ ناگرن، لە گشت لاوە ڕاو دەنرێن. تا دوریان بخەنەوەو هەمیشەش ئازاریان هەیە. مەگین ئەوەی هەر لەپڕ شتێ بفرێنێ ئەویش بڵێسەی گڕێکی شوێن

---

[1] الانعام ١١٢.

[2] أحمد/٥/١٧٨/حەسەنە.

[3] مسلم/١/٣٦٥.

[4] الطبری/١/١١١.

[5] الملك ٥.

[6] الصافات ٦–١٠.

دەکەوێ. وە ئەفەرموێت: ﴿وَلَقَدْ جَعَلْنَا فِي ٱلسَّمَآءِ بُرُوجًا وَزَيَّنَّـٰهَا لِلنَّـٰظِرِينَ ﴿١٦﴾ وَحَفِظْنَـٰهَا مِن كُلِّ شَيْطَـٰنٍ رَّجِيمٍ ﴿١٧﴾ إِلَّا مَنِ ٱسْتَرَقَ ٱلسَّمْعَ فَأَتْبَعَهُۥ شِهَابٌ مُّبِينٌ﴾[1] لەم ئاسمانە چەند بورجێکمان دروست کردوەو ڕازاندومانەتەوەبۆ ئەوانەی سەیر دەکەن. ئەوانەشمان لە گشت شەیتانێکی ترۆکراو پاراست. مەگین ئەوانە بە دزیەوە گوێ دەگرن کە گڕە ئاگرێکی ڕوناك ڕاویان دەنێ. چەندین ئایەتی تریش هەربەم جۆرە هاتوە. وتراوە(رجيم) بەمانای (راجيم)یش هاتووە. چونکە پەلاماری خەڵکی ئەدات وتووشی دوودڵی سەرقاڵی و گومانی دەکات. بەڵام مانای یەکەم دیارترو ڕاسترە.

## ﴿بِسْمِ ٱللَّهِ﴾ یەکەم ئایەتە لە سورەتی فاتیحە

﴿بِسْمِ ٱللَّهِ ٱلرَّحْمَـٰنِ ٱلرَّحِيمِ﴾ هاوەڵەکانی پێغەمبەر بە ﴿بِسْمِ ٱللَّهِ ٱلرَّحْمَـٰنِ ٱلرَّحِيمِ﴾ دەستیان دەکرد بە خوێندنی قورئانی پیرۆز،زانایان کۆدەنگن لەسەر ئەوە کە هەندێکە لە ئایەتێکی سورەتی نەمل، پاشان زانایان ناکۆکیان هەبووە،ئایا ئایەتێکی سەربەخۆیە لە سەرەتای گشت سورەتێکدا یان لە سەرەتای هەموو سورەتێکدا نوسراوە یان هەندێکی ئایەتێکە لە گشت سورەتێکدا، ئەوانەی وتویانە ئایەتێکە لە گشت سورەتێکدا بێجگە لە سورەتی بەرائەت ئیبنو عەباس و ئیبنو عومەرو ئیبنو زوبەیروئیبنو هورەیرەو عەلی یە. وە لە شوێن کەوتواندا عەتا و تاوس و سەعیدی کوڕی جوبەیرو مەکحول و زوهری و عەبدڵای کوڕی موبارەك و شافعی و ئەحمەدی کوڕی حەنبەل، لە ڕیوایەتێکدا ئیسحاقی کوڕی ڕاهوەیلی ئەبو عوبەید قاسمی کوڕی سەلام ڕەحمەتی خوایان لێبێ مالیك و ئەبو حەنیفەو هاوەڵەکانیان وتویانە: نە ئایەتێکە لە فاتیحەو نە لە سورەتەکانی تریشدا،ئەبو داود ئەڵێت: ﴿بِسْمِ ٱللَّهِ ٱلرَّحْمَـٰنِ ٱلرَّحِيمِ﴾ ئایەتێکی سەربەخۆیە لە سەرەتای هەموو سورەتێکدا، بەڵام لە سورەتەکان نیە، ئەم ڕیوایەتە لە ئیمامی ئەحمەدەوە هەتوە.

## بە ئاشکراو بە نەهێنی خوێندن﴿بِسْمِ ٱللَّهِ ٱلرَّحْمَـٰنِ ٱلرَّحِيمِ﴾لە نوێژە ئاشکراکاندا

بەڵام خوێندنی﴿بِسْمِ ٱللَّهِ ٱلرَّحْمَـٰنِ ٱلرَّحِيمِ﴾لە نوێژدا، ئەوەی دەڵێ لە فاتیحە نیە بە ئاشکرا نای خوێنێ وە ئەویش دەڵێ: ئایەتێکە لەسەرەتای فاتیحەوەوە هەر ناخوێنێ بە ئاشکرا، بەڵام ئەوەی دەڵێ: لەسەرەتای سورەتەکانەوەیە یەك ڕا نین، شافعی دەڵێ: بە ئاشکرا دەخوێنرێ لەگەڵ فاتیحەو سورەتەکانی تریشا،ئەمە قسەی هەندێ لە هاوەڵەکانی پێغەمبەرو شوێن کەوتوان وپێشەواپانی پێشینەو پاشینەی موسوڵمانانە، ئەو هاوەڵانەی بە ئاشکرا خوێندویانە: ئەبو هورەیرەو ئیبنو عومەروئیبنو عەباس و موعاوییەیە. ئیبنو عەبولبەڕ. بەیهەقیش گێڕاویانەتەوە لە عەلی و عومەرەوە.

---

[1] الحجر ١٦-١٨.

خەتیبیش لە چوار خەلیفەکەوەهێناویەتی،أبو بەکرو عومەرو عوسمان و علی بەلاّم غەریبە. وە لە شوێنکەوتوانیشەوە لە سەعیدی کوڕی جوبەیرو عیکرەمەو ئەبو قەلابەو زوهری و عەلی کوڕی حەسەن و کوڕەکەی موحەمەدو سەعیدی کوڕی موسەیب و عەتاو تاوس و موجاهید و سالم و موحەمەدی کوڕی کەعبی تورەزی و ئەبو بەکری کوڕی موحەمەدی کوڕی عەمری کوڕی حەزم وئەبو وائیل و ئیبنو سیرین و موحەمەدی کوڕی مونکەدەو عەلی کوڕی عەبدواللەی کوڕی عەباس و کوڕەکەی موحەمەدو نافیعی مەولای ئیبنو عومەرو زەیدی کوڕی ئەسلەم و عومەری کوڕی عبدالعزیزو ئەزرەقی کوڕی قەیس و حەبیبی کوڕی ئەبو سابت و ئەبو شە عساء مەکحول و عەبداللەی کوڕی مەعقیل کوڕی موقەرن. بەیهەقی ئەمەی بۆزیاد کردوە: عەبدواللەی کوڕی سەفوان و موحەمەدی کوڕی حەنەفیە. ئیبنە عبوالبەر ئەمەی بۆ زیاد کردوە: عەمری کوڕی دینار. بەڵگە لەسەر ئەوە کە هەندێکە لە فاتیحە و بە ئاشکرا دەخوێنرێت لەگەڵ ئایەتەکانی تریدا. دیسان ڕیوایەت کراوە لە نەسائیەوە لە سونەنەکەیدا و ئیبنو خوزەیحە و ئیبنو حەبان لە هەردوو سەحیحەکەیاندا و حکم لە موستەدرەکە کەیدا لە ئەبوهورەیرەوە کە نوێژی کردوە بە ئاشکرا ﴿بِسْمِ اللَّهِ الرَّحْمَٰنِ الرَّحِيمِ﴾ی خوێندوە. کاتێ کە لە نوێژەکە بوەتەوە وتی: نوێژی من لە نوێژی پێغەمبەر(ﷺ) دەچێ زیاتر لە ئێوە. دارولقوتنی خەتیب و بەیهەقی و کەسانی تریش بە سەحیحیان داناوە[1]. وە لە سەحیحی بوخاریدا هاتوە لە ئەنەس کوڕی مالیکەوە کە پرسیار کرا لە خوێندنەوەی پێغەمبەر(ﷺ) وتی: (خوێندنەوەی بە درێژکردنەوە بووە) پاشان ﴿بِسْمِ اللَّهِ الرَّحْمَٰنِ الرَّحِيمِ﴾ی خوێندوە ﴿بِسْمِ اللَّهِ﴾ درێژکردوەتەوە،( الرَّحْمَٰنِ) درێژکردوەتەوە،( الرَّحِيمِ ) درێژکردوەتەوە[2]. وە لە موسنەدی ئیمامی ئەحمەداو سونەنی ئەبو داودو سەحیحی ئیبنو خوزەیمە و موستەدرەکی حاکیم دا هاتووە لە ئوموسەلەمەوە ڕەزای خوای لێبێ: پێغەمبەری خودا(ﷺ) خوێندنی دەبڕی جیادەکردەوە: ﴿بِسْمِ اللَّهِ الرَّحْمَٰنِ الرَّحِيمِ ① الْحَمْدُ لِلَّهِ رَبِّ الْعَالَمِينَ ② الرَّحْمَٰنِ الرَّحِيمِ ③ مَالِكِ يَوْمِ الدِّينِ﴾ دارولقتنی ئەڵێت: سەنەدەکەی سەحیحە[3]. ئیمام ئەبو عەبداللەی شافعی و حاکیم لە موستەدرەکەکەیدا ڕیوایەتیان کردوە لە ئەنەسەوە کە لە مەدینە معاویە نوێژی کرد ﴿بِسْمِ اللَّهِ﴾ی

---

[1] النسائی/٢/١٣٤/، ابن خزیمة/١/١٥١/، صحیح ابن صبان/٣/١٤٣/، الحاكم/١/٢٣٢/، الدار قطن/١/٣٠٥/، البیهقی /٢/٤٦ ص٢٠، فەرمودەیەکی باشە(جید).

[2] فتح الباری/٨/٧٠٩.

[3] أحمد/٦/٣٠٢/. أبو داود/٤/٢٩٤/، ابن خزیمة/١/٢٤٨/، الحاكم/٢/٢٣١/، الدار قطني/١/٣٠٧، فەرمودەیەکی باشە (جید).

نەکرد کۆچەریەکان نارەزایان دەربڕی لەسەر ئەوە،جاری دووەم نوێژی کرد ﴿بِسْمِ اللَّهِ﴾ی کرد[1]. وەلەم فەرمودەو ئەسەراناوە کە باسمان کرد بەسەو جێ متمانەیە بیکەینە بەڵگە بۆ ئەم قسەیە. جگە لەوانی تر. بەڵام نەیاری و ریوایەتی غەریب و ڕێگاکانی و لاوازکردن و رەخنەگرتن و بە چاك زانینی ئەوە شوێنی تری خۆی هەیە. هەندێکی تر دەڵێن: لە نوێژدا ﴿بِسْمِ اللَّهِ الرَّحْمَٰنِ الرَّحِيمِ﴾بە ئاشکرا ناخوێنرێ، ئەویش جێگیر بووە لە هەر چوار خەلیفەکەوەو عەبداللەی کوڕی موغەفەل وکۆمەڵێ لە شوێن کەوتوان و پاشینەکانیش، ئەوە ڕێبازی ئەبو حەنیفەو سەوری و ئەحمەدی کوڕی حەنبەلە. لە لای ئیمامی مالیك ﴿بِسْمِ اللَّهِ الرَّحْمَٰنِ الرَّحِيمِ﴾ نە بە ئاشکراو نە بە نهێنی هەرگیز ناخوێنرێت، بەڵگەشیان ئەم فەرمودەیەیە کە لە سەحیحی موسلیمداله عایشەوە رەزای خوای لێبێت ئەفەرموێت: پێغەمبەر (ﷺ) دەستی دەکرد بە نوێژ بە (الله أکبر) کردن و خوێندنی ﴿الْحَمْدُ لِلَّهِ رَبِّ الْعَالَمِينَ﴾[2]. وە لە هەردوو سەحیحەکەدا هاتووە لە ئەنەس کوڕی مالیکەوە ئەڵێت: لە پشت پێغەمبەرەوەو ئەبوبەکرەوەو عومەرو عوسمانەوە نوێژم کردوەبە ﴿الْحَمْدُ لِلَّهِ رَبِّ الْعَالَمِينَ﴾ دەستیان پێکردوە. موسلیم ئەڵێت: ﴿بِسْمِ اللَّهِ الرَّحْمَٰنِ الرَّحِيمِ﴾ یان نەکردوە، نە لەسەرەتای خوێندن و نە لە کۆتاییەکەشیدا[3]. وە هەر بەوشێوەیە لە سونەنەکاندا هاتوە لە عەبدللەی کوڕی موغەفەلەوە رەزای خوای لێبێت[4]. ئەمە قسەو بۆچونی ئیمامەکانە رەحمەتی خوایان لێبێت لەم مەسەلەیەدا قسەکانیان لەیەکەوە نزیکە،کە کۆدەنگن لەسەر ئەوە کە دروستە هەرکەسێ بە ئاشکرا یان بە نهێنی ﴿الْحَمْدُ لِلَّهِ رَبِّ الْعَالَمِينَ﴾ بخوێنێ، سوپاس و ستایش بۆ خودای گەورە.

**ڕێزی ﴿بِسْمِ اللَّهِ الرَّحْمَٰنِ الرَّحِيمِ﴾**

ئیمامی ئەحمەد ریوایەتی کردوە لە پیاوێکەوە لە پشت پێغەمبەرەوە بووە(ﷺ) وتی: گوێدرێژەکەی بە پێغەمبەر(ﷺ) منیش وتم: شەیتان کلۆڵ بێ، پێغەمبەر(ﷺ) فەرموی: مەڵێ شەیتان کلۆڵ بێ،کە تۆ وتت شەیتان کلۆڵ بێ،خۆی لا گەورە دەبێ و دەڵێ بە توانای خۆم بەزاندم، ئەگەر وتت ﴿بِسْمِ اللَّهِ﴾ بچوك دەبێتەوە تا وەك مێشێکی لێ دێت[5]. نەسائی ریوایەتی کردوە لە الیوم واللیلە دا

---

[1] مسند الامام شافعی/١/٨٠/، الحاکم/١/٢٣٣.

[2] ابن ابی حاتم/١/١٢.

[3] فتح الباری/٢/٢٦٥/، مسلم/١/٢٩٩. قال الحافظ فی بلوغ المرام: وفی ریوایة أحمد والنسائی و ابن خزیمة.

[4] الترمیزي/٢٤٤.

[5] أحمد/٥/٥٩/ ص٢٠ حەسەنە.

لەئیبنو مەردەوەیهیەوە لە تەفسیرەکەیدا لە ئوسامەی کوڕی عومەیرەوە ئەڵێت: لە پشت پێغەمبەرەوە بوم(ﷺ) باسی کردو فەرموی: ئاوا مەڵێ، چونکە خۆی لا گەورە دەبێ، تا وەك خانویەکی لێ دێت، بەڵکو بڵێ: ﴿بِسْمِ اللَّهِ﴾ بەوە بچوك دەبێتەوە تا وەك مێشێکی لێدێت[1]. ئەوەیش بەهۆی ﴿بِسْمِ اللَّهِ﴾ وەیە.

## لە پێش هەموو کارێکەوە ﴿بِسْمِ اللَّهِ﴾ زۆر چاکە

هەربۆیە سونەت و چاکە ﴿بِسْمِ اللَّهِ﴾ کردن لە هەموو کردارو گفتارێکدا، لەسەرەتای وتار خوێندنیشدا هەر باشە وەك هاتوە. وە لە چونە سەرئاویشدا هەر چاکە وەك فەرمودە هاتوە لەو بارەیەوە[2]. وە لەسەرەتای دەستنوێژ گرتنەوە هەر پێویستە وەك لە موسەنەدی ئیمامی ئەحمەد و سونەنەکاندا هاتووە لە ڕیوایەتی ئەبو هورەیرەو سەعیدی کوڕی زەیدو ئەبو سەعیدەوە بەمەرفوعی: دەستنوێژ نیە بۆ کەسێ کە ﴿بِسْمِ اللَّهِ﴾ی لەسەر نەکات[3]. فەرمودەیەکی حەسەنە. وە لەکاتی نان خواردنیشدا هەر سونەتە، وەك لە سەحیی موسلیمدا هاتوە کەپێغەمبەری خودا(ﷺ)فەرموی بە زڕکوڕەکەی عەمری کوڕی سەلەم بڵێ: بەناوی خوداو بەدەستی ڕاستت بخۆ و لەبەر دەمی خۆتەوە بخۆ[4]. وە هەندێ لەزانایان بە واجبیان داناوە،وە ناوی خوا هێنان لەکاتی سەرجێی کردنا سونەتە،وەك لەهەردوو سەحیحەکەدا هاتوە لە ئیبنو عەباسەوە کە پێغەمبەری خودا(ﷺ) فەرمویەتی: ئەگەر یەکێ لەکاتی سەرجێی کردنا لەگەڵ هاوسەرەکەیدا بڵێ: ﴿بِسْمِ اللَّهِ﴾ خوایە شەیتانمان لێدور بخەرەوە،لە نەوەکانیشکان بەدوری بگرە، ئەگەر لەوکاتەدا خودا هەر منداڵێکیان پێببەخشێ هەرگیز شەیتان زیانی پێناگەیەنێت[5].

## ﴿بِسْمِ اللَّهِ﴾ پەیوەندی بەچیەوە هەیە

ئا لێرەدا بۆت ڕون دەبێتەوەکە دوو ڕاکەی زانایانی زمانەوانی دەربارەی ئەوەی پەیوەندی بە پیتی باءەوە -البا- هەیە، دەڵێن: ﴿بِسْمِ اللَّهِ﴾ ئایەتەو شتە فعلە لە یەکەوە نزیکن. هەرچی دەربارەی لە قورئاندا هاتوە،یان بە ئیسم دانراوە. خەملێنراوە: بە ﴿بِسْمِ اللَّهِ﴾ أبتدائی، وەك خودای گەورە

---

[1] النسائی فی الکبرا/٦/١٤٢/ حەسەنە.

[2] عون المعبود/١/٦/ ص٢١.

[3] أحمد/٣/٤١/، أبو داود/١/٧٥/، تحفةالاحوذي/١/١١٥/، حەسەنە. النسائی /١/٦١/، ابن ماجة/١/١٤٠.

[4] مسلم /٣/١٦٠٠.

[5] فتح الباری/٩/١٣٦/، مسلم/٢/١٠٥٨ ص٢١.

ئەفەرموێت: ﴿وَقَالَ ارْكَبُوا فِيهَا بِسْمِ اللَّهِ مَجْرَاهَا وَمُرْسَاهَا إِنَّ رَبِّي لَغَفُورٌ رَحِيمٌ﴾[1] وتی: لەناویدا سوار بن ڕوانەبونی و لەنگەری بەناو خودایە،خودای من لێبوردەو دلۆڤانە،وە ئەوەی بە –فعل– خەملاندویەتی،ئەو فعلە ئەمر بێت یان خەبەر بێت وەك: إبدا بأسم الله –یان– ابتدأت باسم الله– لەبەر ئەوەیە کە خودای گەورە ئەفەرموێت: ﴿اقْرَأْ بِاسْمِ رَبِّكَ الَّذِي خَلَقَ﴾[2]. بخوێنە! بەناوی پەروەردگارتەوەکە هەمو شتێکی دروست کردوە،هەردوو ڕاکە ڕاستە. چونکە فعل دەبێ سەرچاوەیەکی هەبێ بۆت هەیە کە فعل و سەرچاوە ڕەچاو بکەی. ئەویش بە پێی ئەو فعلەی کە بۆی ناونراوە لە پێشیەوە، ئەگەر بۆ –قیاما وقعودا أو أقلا أو شرابا أو قراءة أو ضوءا أوصلاة– ئەوەی دروستە هێنانی ناوی خودایە، لە هەڵسان بەو شتانە هەمووی بۆ پیرۆزی و پیشت بەستن و وەرگرتنی ئەو شتانەیە کە بەناوی خوداوەیە. والله أعلم.

**مانای وتەی الله**

الله ناوەی پەروەردگاری پاك و بێعەیب و هەرە مەزنە، پێشی دەوترێ ناوی هەرە مەزن، چونکە بە گشت ئەو وەسفانە وەسف دەکرێ،وەك خودای گەورە ئەفەرموێت: ﴿هُوَ اللَّهُ الَّذِي لَا إِلَٰهَ إِلَّا هُوَ عَالِمُ الْغَيْبِ وَالشَّهَادَةِ هُوَ الرَّحْمَٰنُ الرَّحِيمُ ﴿٢٢﴾ هُوَ اللَّهُ الَّذِي لَا إِلَٰهَ إِلَّا هُوَ الْمَلِكُ الْقُدُّوسُ السَّلَامُ الْمُؤْمِنُ الْمُهَيْمِنُ الْعَزِيزُ الْجَبَّارُ الْمُتَكَبِّرُ سُبْحَانَ اللَّهِ عَمَّا يُشْرِكُونَ ﴿٢٣﴾ هُوَ اللَّهُ الْخَالِقُ الْبَارِئُ الْمُصَوِّرُ لَهُ الْأَسْمَاءُ الْحُسْنَىٰ يُسَبِّحُ لَهُ مَا فِي السَّمَاوَاتِ وَالْأَرْضِ وَهُوَ الْعَزِيزُ الْحَكِيمُ﴾[3] ئەو خودایەی وایە کە غەیرەز ئەو بۆ پەرستن نابێت،لە نەدیارو دیاران ئاگادارەو بەخشندەو دلۆڤانە، ئەو خودایە کەلەو بەدەر شیاوی پەرستن نیە پادشایە. پاکو بێگەردە. سەرچاوەی هێمنایەتی، هێمنی دەرە بەسەر هەموو شتێکا ڕادەگا،گشت دەسەلآت بەدەست ئەوە،بەسەر هەموو شتێکا زاڵە شایستەی هەمو گەورەیەکە، خودا پاکە لەو شتانەی ئەوان دەیکەنە شەریکی. هەر ئەو خودای وەدیهێنەری داهێنەری وێنە گر،ناوی هەرە جوان بۆ ئەوە،هەرشتێ لە ئاسمان و زەویدا پەسەنی پاکی ئەو ئەدەن و هەر خۆیەتی بەدەسەلآتی کارزان. ئەو ناوانەی تر هەمووی سیفاتی خودان. وەك ئەفەرموێت: ﴿قُلِ ادْعُوا اللَّهَ أَوِ ادْعُوا الرَّحْمَٰنَ أَيًّا مَا تَدْعُوا فَلَهُ الْأَسْمَاءُ الْحُسْنَىٰ وَلَا تَجْهَرْ بِصَلَاتِكَ وَلَا تُخَافِتْ بِهَا وَابْتَغِ بَيْنَ ذَٰلِكَ سَبِيلًا﴾[4]. بەڵێ:

---

[1] هود ٤١.

[2] العلق ١.

[3] الحشر ٢٢–٢٤.

[4] الاسراء ١١٠.

هاوار لە خوا بکەن یان هانا بە ڕەحمان بەرن، هەریەکێکە. ئەو ناوی زۆر پیرۆزی هەیە. وە لە هەردوو سەحیحەکەدا هاتوەلە ئەبو هورەیرەوە کە پێغەمبەری خودا(ﷺ) فەرمویەتی: خودا نەوەدو نۆ ناوی هەیە،سەد یەکێ کەم،هەرکەسێ هەژماری دەکا دەچێتە بەهەشت[1].

## ماناى بەخشندەی دلۆڤان

﴿ٱلرَّحۡمَٰنِ ٱلرَّحِيمِ﴾ دەهەندەو دلۆڤان. دوو ناوت لە الرحمە دەرهێنراون لەسەر شێوەی موبالەغە بەڵام ( ٱلرَّحۡمَٰنِ ) بەلیغ ترە لە (ٱلرَّحِيمِ ) وە لە قسەکەی ئیبنو جەریرەوە وەردەگیرێ کە هاودەنگی هەیە لەسەر ئەمە. قورتوبی وتی: بەڵگە لەسەر ئەوە دەرهێنراوە ئەو فەرمودەیە کە ترمزی هێناویەتی و بە سەحیحیشی داناوە لە عەبدولڕەحمانی کوڕی عەوفەوە ڕەزای خوای لێبێت کە بیستویەتی لە پێغەمبەری خوداوە (ﷺ) کە ئەیفەرمو: خودای گەورە فەرمویەتی: من ڕەحمانم ڕەحمم وەدی هێناو ناوێکم بۆ دەرهێنا لە ناوی خۆم،هەرکەسی سیلەی ڕەحمی بەجێ هێنا، منیش دەیگەیەنم بەڕەحمی خۆم، هەرکەسیش بریبێتی منیش بریومە. وتی: ئەمە دەقێکە لە دەرهێناندا، دان نەنانی عەرەب بەناوی ( ٱلرَّحۡمَٰنِ )دا لە نەفامیەوە بووە بەرانبەر بە خوداو ئەوەی پێویستە دەربارەی خودا. قورتوبی گوتی: پاشان وتراوە: ﴿ٱلرَّحۡمَٰنِ ٱلرَّحِيمِ﴾ هەردوکیان یەك مانان، وەك: (ندمان وندیم) ئەبو عوبەیدەیش هەروای وتوە، وتراویشە: دروستکردنی فعلان وەك فعیل نیە. چونکە فعلان نابێ مەگین دەبێ لەسەر موبالەغەی فعل بێت وەك ئەمە قسەی تۆ: غضبان بۆ پیاوێ کە زۆر تورەیە. بەڵام فعیل بە مانای الفاعل والمفعول دێت. ئەبو عەلی فارسی وتی: (ٱلرَّحۡمَٰنِ ) ناوێکی گشتگیرە بۆ هەموو جۆرێکی بەزەییە کە تایبەتمەندە بە خوداوە. بەڵام (ٱلرَّحِيمِ ) دەربارەی خاوەن باوەڕانە. وەك خودای گەورە ئەفەرموێت: ﴿هُوَ ٱلَّذِي يُصَلِّي عَلَيۡكُمۡ وَمَلَٰٓئِكَتُهُۥ لِيُخۡرِجَكُم مِّنَ ٱلظُّلُمَٰتِ إِلَى ٱلنُّورِۚ وَكَانَ بِٱلۡمُؤۡمِنِينَ رَحِيمٗا﴾[2]. خودا بۆ خاوەنباوەڕان دلۆڤانە. ئیبنو عەباس ئەڵێت: دوو ناوی ناسکن هەریەکەیان لەوی تریان ناسکترە. واتە زیاتر ڕەحمەتە[3]. ئیبنو جەریر ئەڵێت: سری کوڕی یەحیای تەمیمی بۆی گێڕاینەوە، عوسمانی کوڕی زەفر بۆی گێڕاینەوە کە بیستم لە عەزرەمیەوە دەیوت: (ٱلرَّحۡمَٰنِ ) بۆ گشت دروستکراوەکان

---

[1] فتح الباری/١١/٢١٨/، مسلم/٤/٢٦٢ ص٢١.

[2] الاحزاب ٤٣.

[3] القرطبي/١/١٠٥ ص٢١.

(ٱلرَّحِيمِ ) بۆ خاوەنباوەڕان[1] . وتیان: بۆیە خودای گەورە ئەفەرموێت: ﴿ ٱلَّذِى خَلَقَ ٱلسَّمَٰوَٰتِ وَٱلْأَرْضَ وَمَا بَيْنَهُمَا فِى سِتَّةِ أَيَّامٍ ثُمَّ ٱسْتَوَىٰ عَلَى ٱلْعَرْشِ ٱلرَّحْمَٰنُ فَسْـَٔلْ بِهِۦ خَبِيرًا ﴾[2]. لەسەر تەختی فەرمانڕەوایی خۆی دامەزراوە، هەر ئەویشە خودای ڕەحمان. وە ئەفەرموێت: ﴿ٱلرَّحْمَٰنُ عَلَى ٱلْعَرْشِ ٱسْتَوَىٰ ﴾[3]. ئەو ڕەحمانەی لەسەر تەختی خۆی دامەزرا. خودا باسی دامەزراندنی هێناوە بەناوی خۆیەوە کە ڕەحمانە، بۆئەوەی بەزەیی خۆی هەموو دروستکراوەکانی بگرێتەوە. وە ئەفەرموێت: ﴿ هُوَ ٱلَّذِى يُصَلِّى عَلَيْكُمْ وَمَلَٰٓئِكَتُهُۥ لِيُخْرِجَكُم مِّنَ ٱلظُّلُمَٰتِ إِلَى ٱلنُّورِ وَكَانَ بِٱلْمُؤْمِنِينَ رَحِيمًا ﴾[4]. خودا بۆ خاوەنباوەڕان دڵۆڤانە خاوەن باوەڕانیشی تایبەتمەند کردوە بە ناوی خۆیەوە (ٱلرَّحْمَٰنِ )ە وتویانە: ئەمە بەڵگەیە لەسەر ئەوە کەناوی (ٱلرَّحْمَٰنِ ) بەزەیی زیاتری تێدایەوگشتگیر ترەلە هەردوو دنیادا دەربارەی دروستکراوەکانی. بەڵام (ٱلرَّحِيمِ ) تایبەتە بە خاوەنباوەڕانەوە. بەڵام لە دوعای مەئسوردا هاتوە: ڕەحمانی دنیاو ڕۆژی دوایی ورەحیمی دنیاو ڕۆژی دوایی. ناوی ڕەحمان تایبەتە بە خودا خۆیەوە. ئەو ناوە بۆ هیچ کەسی تر نابێ. وەك خودای گەورە ئەفەرموێت: ﴿قُلِ ٱدْعُوا۟ ٱللَّهَ أَوِ ٱدْعُوا۟ ٱلرَّحْمَٰنَ أَيًّا مَّا تَدْعُوا۟ فَلَهُ ٱلْأَسْمَآءُ ٱلْحُسْنَىٰ وَلَا تَجْهَرْ بِصَلَاتِكَ وَلَا تُخَافِتْ بِهَا وَٱبْتَغِ بَيْنَ ذَٰلِكَ سَبِيلًا ﴾[5] بڵێ: هاوار لە خودا بکەن،یان هانا بەڕەحمان بەرن هەر یەکێکە. ئەو ناوی زۆر پیرۆزی هەیە. وە ئەفەرموێت: ﴿ وَسْـَٔلْ مَنْ أَرْسَلْنَا مِن قَبْلِكَ مِن رُّسُلِنَآ أَجَعَلْنَا مِن دُونِ ٱلرَّحْمَٰنِ ءَالِهَةً يُعْبَدُونَ ﴾[6] لەو پێغەمبەرانەش بپرسە کە بەر لە تۆ ڕەوانەکراون، ئایە ئێمە بڕیارمان داوە جگە لە خودا هیچ شتی تر پەرست بێ؟ کاتێ کە موسەیلەمەی درۆزن ناوبانگی بلاوەی کرد ناوی لێنرا ڕەحمانی یەمام، خودای گەورە پۆشاکی درۆزنی کرد بە بەریداو ناوبانگی پێوە دەرکرد. ناوی نەدەهێنرا بە موسەیلەمەی درۆزن نەبێ. وای لێهات بو بە نمونەی درۆزن لەناو خەڵکیدا لە شارو لادێ و دەوارنشین و عەرەبە کۆچەریەکاندا. بەو شێوەیە ناوی خودا کە (ٱلرَّحْمَٰنِ ) ەبو بەو ناوە

---

[1] الطبري/١/١٢٧ ص٢٢.

[2] الفرقان ٥٩.

[3] طه ٥.

[4] الاحزاب ٤٣.

[5] الاسراء ١١٠.

[6] الزخرف ٤٥.

کەهیچ کەس بۆی نەبێ خۆ پێ ناو بنێ تەنیا خودا خۆی نەبێ. وەك ئەفەرموێت: ﴿قُلِ ادْعُوا اللَّهَ أَوِ ادْعُوا الرَّحْمَنَ أَيًّا مَا تَدْعُوا فَلَهُ الْأَسْمَاءُ الْحُسْنَى وَلَا تَجْهَرْ بِصَلَاتِكَ وَلَا تُخَافِتْ بِهَا وَابْتَغِ بَيْنَ ذَلِكَ سَبِيلًا﴾[1]. بڵێ هاوار لە خودا بکەن یان هانا بە ڕەحمان بەرن هەر یەکێکە ئەو ناوی زۆر پیرۆزی هەیە. کاتێ کەموسەیلەمە ناووی خۆی بەوە نا،کەس ئەو ناوەی بەکار نەدەهێنا جگە لەوانەی کە شوێنی کەوتبون و لەو گومڕایەدا لەگەڵی بون. بەڵام –الرحیم– خودای گەورە وەسفی غەیرەز خۆی پێکردوەو ئەفەرموێت: ﴿لَقَدْ جَاءَكُمْ رَسُولٌ مِنْ أَنْفُسِكُمْ عَزِيزٌ عَلَيْهِ مَا عَنِتُّمْ حَرِيصٌ عَلَيْكُمْ بِالْمُؤْمِنِينَ رَءُوفٌ رَحِيمٌ﴾[2] پێغەمبەرێك هاتە لاتان لە خۆتانە،هەر بەڵایە بەسەرتان بێ لای گرانە. زۆر دڵی لەسەر ئێوەیە،دڵسۆزی باوەڕدارانەو دلۆڤانە. وەك چۆن وەسفی غەیرەز خۆیشی کردوەبە ناوەکانی، وەك ئەفەرموێت: ﴿إِنَّا خَلَقْنَا الْإِنْسَانَ مِنْ نُطْفَةٍ أَمْشَاجٍ نَبْتَلِيهِ فَجَعَلْنَاهُ سَمِيعًا بَصِيرًا﴾[3] ئێمە مرۆڤمان لە تنۆکە ئاوێکی ئاوێتە وەدی هێنا تا تاقی بکەینەوە،گوێی بیستن و سۆمای بینینیشم پێدا. کورتەی باسەکە ئەوەیە هەندێ لە ناوەکانی خودا،ناوی کەسی تری لێنەنراوە،هەندێکیش ناوی جگە لە خودا خۆی لێنراوە. وەك –الله–الرحمن–الخالق–الرزاق–لەم جۆرە،هەربۆیە بەناوی خودا دەستی پێکردوەووەسفیشی کردوە بە –الرحمن– چونکە ناسراوترو تایبەترە لە –الرحیم– چونکە ئەو ناو هێنانە ئەبێ بە بەڕێزترین ناوو تایبەترین ناو بێ. هەربۆیە بەم ناوە تایبەتە دەستی پێکردوە وە لە فەرمودەی ئوموسەلەمەدا هاتوە کە پێغەمبەری خوداﷺ خوێندنەکەی پیت پیت دەیبڕی﴿بِسْمِ اللَّهِ الرَّحْمَنِ الرَّحِيمِ ۝ الْحَمْدُ لِلَّهِ رَبِّ الْعَالَمِينَ ۝ الرَّحْمَنِ الرَّحِيمِ ۝ مَالِكِ يَوْمِ الدِّينِ﴾. هەندێکیان هەروا خوێندویانەتەوە،هەندێکیشیان ئەیایە دەم یەك﴿الْحَمْدُ لِلَّهِ رَبِّ الْعَالَمِينَ﴾.

**﴿الْحَمْدُ لِلَّهِ رَبِّ الْعَالَمِينَ﴾ مانای ستایش الحمد**

ئەبو جەعفەری کوڕی جەریرئەڵێت: مانای ﴿الْحَمْدُ لِلَّهِ﴾ ستایش کردنی خوایە بە دڵسۆزی جگە لەو شتانە کە دەپەرسترێ جگە لەو، بە هۆی بەخشینی ئەو بەهرانەی کە لە ژمارە نایەت کە داویەتی بە عەبدەکانی. هیچ کەس پەی بە ژمارەی نابا جگە لە خودا خۆی، وە ڕێکخستنی ئەندامەکانی مەردم بۆ گوێڕایەڵی و بەندایەتی کردنی، توانینی ئەندامەکانی لاشەی ئەوانی کە پێیان سپێراوە هەڵسن بە

---

[1] الاسراء ١١٠.

[2] التوبة ١٢٨.

[3] الانسان ٢.

فەرزەکانی، لەگەڵ ئاسانکاری بۆیان لە بەدەست هێنانی بژێوی ژیان لە دونیاداو بەدەست هێنانی گوزەرانێکی خۆش بۆیان، کە شایەنی ئەوەش نین کە پێت داون. وە ئاگاداری کردون لەو هۆکارانە کە بەرەو ژیانێکی هەتاهەتایی دەیان بات، وە ماڵێکی هەمیشەیی لە بەهەشتی بەرینی نەبڕاوەشدا. سوپاس و ستایش بۆ پەروەردگارمان لەسەر ئەو بەهرانەی هەموو لە گشت کاتێکدا[1]. ئیبنو جەریر ئەڵێت: ﴿ٱلۡحَمۡدُ لِلَّهِ﴾ ستایشێکە خودا خۆی کردویەتی لەسەر خۆی، لە نێوانیشا دیارە کە فەرمان دەکا بە عەبدەکانی کە سوپاس و ستایشی بکەن،وەك ئەوە وایە کە بفەرموێ: بڵێن سوپاس و ستایش بۆ خودای گەورە. وە وتی: وتراوە،ئەو کەسەی دەڵێ سوپاس بۆ خودا، ستایشی خودایە بەناوە پیرۆزەکانی و سیفەتە بەرزەکانی. وە کە دەڵێ: (الشكر لله) سوپاس بۆ خودا لەسەر دەسەڵات و بەهرەکانی[2].

## جیاوازی لە نێوان الحمد والشكر

ئەگەر وەردەکاری لە نێوانیاندا بکەی گشتگیری و تایبەتمەندیەك هەیە. وتەی (ٱلۡحَمۡدُ ) گشتگیر ترە لە وتەی(الشكر) بە پێی دارشتنەکەیان، چونکە (الحمد) لەسەر سیفەتی لازم و متعدی یشە. تۆ دەڵێت: حمده لفروسیه واتە: ستایشم کرد لەبەر سوارچاکی و رێزگرتنی. ئەمە تایبەتە. چونکە هەر بەقسە نابێ و ناکرێ، بەڵام (الشكر) گشتگیرترە بە پێی دارشتنەکەی چونکە بە قسەو کرداروو نیازیشە،ئەمەیش تایبەتمەندیەکی ترە. ئەمیش تەنیا لەسەر سیفەتە متعدیەکانە ناوترێ شكرية لفروسية، بەڵکو دەڵێن: شكريه على كرمه و إحسانه، ئەمە کورتەی ئەم باسەیە کە پاشینەکان هێناویانە والله أعلم. ئەبو نەسر ئیسماعیلی کوڕی حەمماد جەوهەری وتی: الحمد پێچەوانەی زەمە. دەڵێن: حمدت الرجل أحمده حمدا و محمدة فهو حميد و محمود، التحميد بەلیغ ترە لە الحمد، الحمد یش گشتگیر ترە لە الشكر ستایش کردنە لەسەر ئەو چاکە کارە لەسەر ئەو چاکەیەی کردویەتی. دەوترێ شکریە، وشکرت بەڵام بە لازم سەجع ترە. بەڵام المدح لە الحمد گشتگیرترە. چونکە بۆ مردوو زیندوو بێگیانیش دەبێ. وەك چۆن مەدحی خواردن و شوێن و شتی تریش دەکرێ. وە پێش چاکە کردن و لە دوایشەوە هەردەبێ. وە لەسەر سیفەتی لازم و متعدیش هەردەبێ و گشتگیرترە.

## باسە قسەی پێشینەکان لەسەر الحمد

جگە لە ئەبو موعەمەریش ریوایەتی کردوەلە حەفسەوە ئەڵێت: عومەر وتی بە عەلی ئەو هاوەڵانەی کە لەلای بون: لا اله إلا الله وسبحان الله و الله أكبر مان زانیوە، ئەی (الحمد لله) چۆنە؟ عەلی وتی:

---

[1] الطبری/١/١٣٥،ص٢٢.

[2] الطبری/١/١٣٧.

وتەیەکە خودا بۆ خۆی پێی خۆشەو پێیڕازیە بۆ خۆی و پێشی خۆشە بوترێ[1]. ئیبنو عەباس ئەڵێت: (الحمد لله) واتای ستایشە، کاتێ عەبد ئەڵێت: (الحمد لله) خودای گەورە ئەفەرموێت: عەبدەکەم ستایشی کردم[2].

## چاکەکانی الحمد

ئیمامی ئەحمەد ڕیوایەتی کردوە لە ئەسوەدی کوڕی سەریعەوە، وتی: ئەی پێغەمبەری خودا(ﷺ)ئایا فێری ستایشێکم ناکەی کەسوپاسی پەروەردگاری گەورەی پێبکەم؟ فەرمووی: بێگومان پەروەردگارت ستایشی(الحمد) پێخۆشە[3]. نەسایش ڕیوایەتی کردوە. تیرمزی و نەسائی و ئیبنو ماجە ڕیوایەتیان کردوە لە فەرموودەکەی موسای کوڕی ئیبراهیمی کوڕی کەسیرەوە لە تەلحەی کوڕی خەراشەوەلە جابیری کوڕی عەبدالله وە وتی: پێغەمبەری خودا(ﷺ) فەرمویەتی: چاکترین زیکر (لا إله الا الله) یەو چاکترین دوعاش الحمدە[4]. تیرمزی ئەڵێت: فەرمودەیەکی حەسەنی غەریبە. ئیبنو ماجە ڕیوایەتی کردوە لە ئەنەسەی کوڕی مالیکەوە ڕەزای خوای لێبێت، وتی: پێغەمبەری خودا(ﷺ) فەرمویەتی: هیچ بەهرەیەك نیە لەو بەهرانەی خودا دابێتی بە عەبدێك مەگین ئەوەی کە داویەتی چاکترە لەوەی کە وەری گرتوە[5]. وە لە سونەنی ئیبنو ماجەدا هاتوە لە ئیبنو عومەرەوە کە پێغەمبەری خودا(ﷺ) قسەی بۆ کردون و فەرمویەتی: بەندەیەك لە بەندەکانی خودا وتی: ئەی پەروەردگارم سوپاس بۆتۆ. وەك ئەوەی کە پێویستە بە شکۆی تۆ و گەورەیو هێزو دەسەڵاتت. بەڵای دوو فریشتەکەوە گران ودژوار بوو نەیان دەزانی چۆنی بنوسن، بەرەو ژور بونەوە بۆ لای خوداو وتیان: ئەی پەروەردگارمان! بەندەیەك قسەیەکی کردوە نازانین چۆنی بنوسین، خودای گەورە فەرموی: خۆی چاك دەزانێ عەبدەکەی چی وتوە بەندەکەم چی وتوە؟ وتیان: ئەی پەروەردگار! ئەو وتی: یارب لك الحمد کما ینبغی لجلال وجهك و عظیم سلطانك، خودای گەورەفەرموی پێیان: وەك ئەوەی بەندەکەم وتویەتی بینوسن، تا پێم دەگا، پاداشتی ئەدەمەوە بەوەی کە وتویەتی[6].

---

[1] ابن ابی حاتم/١/١٥ ص٢٣/، لاوازە لەبەر لاوازی مەجاجی کوڕی أرطأة.

[2] ابن ابی حاتم/١/١٣.

[3] أحمد/٣/٤٣٥/، النسائی فی الکبرا/٤/٤١٦/،حەسەنە.

[4] حفة الاحوذی /٩/٣٢٤/، النسائی فی الکبرا/٦/٢٠٨، ابن ماجة/٢/١٢٤٩/حەسەنە.

[5] ابن ماجة /٢/١٢٥٠/حەسەنە.

[6] ابن ماجة/٢/١٢٤٩/مەقبولە.

**ئەو (ئەلف ولامە) لە الحمد دا بۆ ئیستیغفارە**

ئەو ئەلف و لامـە بـۆ چـونە نـاوی هـەموو جـۆرو چەشـنەکانی الحمـد بـۆ خـودای گـەورە. وەك لـەم فەرمودەدا هاتووە: ئەی خودایە گشت ستایشێك هەر بۆتۆیە، هەرچی دەسـەڵاتە هـەر هـی تۆیـە، هـەر چی چاکەیە هەر بەدەستی تۆیە، هەموو شتێکیش هەر بۆلای تۆ دەگەڕێتەوە [١].

**مانای پەروەردگار الرب**

(الرب)یانی: خاوەنی دەسەڵاتدار، وە لەزماندا بۆ گەورە السید بەکار دەهێنرێ وە بۆ کاربەدەستیش بەکاردەهێنرێ بۆ چاکسازی، ئەمانە هەموو ڕاستە لە هەقی خوادا. وتەی (الرب) تەنیا بۆ خودا بەکار دەهێنرێ. بۆ غەیرەز خودا بەکار ناهێنرێ بە ئیزافە کردن نەبێ. وەك بڵێین: الرب الدار، ورب کذا، بەڵام رب تەنیا بۆ خودا بەکار دەهێنرێ. وتراویشە رب لە ناوە هەرە مەزنەکانە الاسم الاعظم.

**مانای العلمین**

العلمین کۆی العالم هەرچی هەیە جگە لە خودای گەورە. العالم کۆیەو تاکی نیە لە وتەکەیدا. العوالم جۆری دروستکراوەکانە لە ئاسمانەکان و وشکایی و دەریادا. وەگشت چەرخ و نەوەیەکیش هەرپێی دەوترێ عالم، فراء و ئەبو عوبەید دەڵێن: العالم بریتیە لەوەی خاوەن ئاوەزە لە مرۆڤ و جنۆکەو فریشتەو شەیتانیشن، بە ئاژەڵ و ولاخ و مالآت ناوترێ عالم. لە زەیدی کوڕی ئەسلەم و ئەبو محیسنەوەئەڵێن: هەموو جۆرو پۆلێ عالەمە عالم. زەجاج ئەڵێت: ئەوەی لە دونیاو ڕۆژی دوایدا دروستکراوەپێی دەڵێن عالەم، قرتوبی ئەڵێت: هەر ئەوە ڕاستە چونکە عالم هەردوو جیهانەکە دەگرێتەوە. وەك خودای گەورە ئەفەرموێت: ﴿قَالَ فِرۡعَوۡنُ وَمَا رَبُّ ٱلۡعَٰلَمِينَ ﴿٢٣﴾ قَالَ رَبُّ ٱلسَّمَٰوَٰتِ وَٱلۡأَرۡضِ وَمَا بَيۡنَهُمَآۖ إِن كُنتُم مُّوقِنِينَ﴾ [٢] فیرعەون وتی: پەروەردگاری هەموو جیهان بەکێ دەڵێن؟ وتی: ئەگەر بڕوا بکەن ڕاهێنەری ئاسمانەکان و زەمینەو هەرچی لە ناویاندا هەیە.

**مەبەست لە ناو هێنانی (العالم)**

(العالم) لە (العلامە)تەوە دەرهێنراوە. منیش دەڵێم: چونکە(عالم) جیهان بەڵگەیە لەسەر بونی دروستکەرو وەدی هێنەرە تاك و تەنیاکەی کە خودایە [٣].

---

[١] الترغیب والترهیب/٢/٢٥٣/، سەنەدەکانی لاوازە.

[٢] الشعراء ٢٣-٢٤.

[٣] القرطبی/١/١٣٩ ص٢٣.

﴿ٱلرَّحۡمَٰنِ ٱلرَّحِيمِ﴾

خودای گەورە ئەفەرموێت ﴿ٱلرَّحۡمَٰنِ ٱلرَّحِيمِ﴾ بەخشندەی دلۆڤان. لە باسی (بِسۡمِ ٱللَّهِ) دا قسەمان دەربارەی کرد پێویست ناکا لێرەدا دوبارەی بکەینەوە. قورتوبی ئەڵێت: خودای گەورە وەسفی خۆی کردوە بە ﴿ٱلرَّحۡمَٰنِ ٱلرَّحِيمِ﴾ دوای ئەوە کە فەرمویەتی (رَبِّ ٱلۡعَٰلَمِينَ )پەروەردگاری گشت جیهان. ئەمەیش لە بەشی خستنە پاڵی تەرغیبە دوای تەرهیب. وەك خودای گەورە ئەفەرموێت: ﴿۞ نَبِّئۡ عِبَادِيٓ أَنِّيٓ أَنَا ٱلۡغَفُورُ ٱلرَّحِيمُ ۝٤٩ وَأَنَّ عَذَابِي هُوَ ٱلۡعَذَابُ ٱلۡأَلِيمُ﴾[1]. هەواڵ بدە بە بەندەکانم کە: هەر خۆم لە گوناهان دەبورم و دلۆڤانم سزاشم زۆر بەژانە. وە ئەفەرموێت: ﴿وَهُوَ ٱلَّذِي جَعَلَكُمۡ خَلَٰٓئِفَ ٱلۡأَرۡضِ وَرَفَعَ بَعۡضَكُمۡ فَوۡقَ بَعۡضٖ دَرَجَٰتٖ لِّيَبۡلُوَكُمۡ فِي مَآ ءَاتَىٰكُمۡۗ إِنَّ رَبَّكَ سَرِيعُ ٱلۡعِقَابِ وَإِنَّهُۥ لَغَفُورٞ رَّحِيمُۢ﴾[2] پەروەردگارت بە پەلە تۆڵە دەستێنێ و هەر ئەویشە کە لە گوناهان دەبورێ و دلۆڤانە. وتەی (الرب) تەرهیبی تێدایە، وتەی ﴿ٱلرَّحۡمَٰنِ ٱلرَّحِيمِ﴾ تەرغیبی تێدایە. وە لە سەحیحی موسلیمدا هاتوە لە ئەبو هورەیرەوەئەڵێت: پێغەمبەری خودا (ﷺ)ئەفەرموێت: گەر خاوەنباوەڕ بیزانیایە خودا چەندە سزای لەلایە ئەوە هەرگیز کەس بە تەمای بەهەشتەکەی نەدەبو وە ئەگەر بێباوەڕیش بیزانیایە خودا چەندە بەزەیی بەلاوەیە ئەوە هەرگیز کەس لە بەهەشتەکەی نائومێد نەدەبوو[3].

**﴿مَٰلِكِ يَوۡمِ ٱلدِّينِ﴾ خاوەنی ڕۆژی سزاو پاداشت دانەوە، مانای تایبەت کردنی دەسەلآت بە ڕۆژی قیامەتەوە**

تایبەت کردنی خاوەنیەتی بە ڕۆژی تۆڵەو پاداشت دانەوە،مانای وا نیە کە خاوەنی جگەلە ڕۆژی قیامەت نیە. لە پێشەوە باسمان کرد کە داهێنەری جیهانە،وە ئەمە گشتگیرە بۆ دنیا و قیامەت. لەبەر ئەوە ئیزافە کراوە بۆ (يَوۡمِ ٱلدِّينِ ) چونکە هیچ کەس لە ڕۆژی قیامەتدا بانگەشەی بۆ ناکا. بە ئیزنی خودا نەبێ قسە ناکا. وەك خودای گەورە ئەفەرموێت: ﴿يَوۡمَ يَقُومُ ٱلرُّوحُ وَٱلۡمَلَٰٓئِكَةُ صَفّٗاۖ لَّا يَتَكَلَّمُونَ إِلَّا مَنۡ أَذِنَ لَهُ ٱلرَّحۡمَٰنُ وَقَالَ صَوَابٗا﴾[4] ڕۆژێکە کە جوبرەئیل و فریشتەکان هەموو بە ڕیز ڕاوەستاون قسە ناکەن

---

[1] الحجر/٤٩–٥٠، القرطبي/١/١٣٩ ص٢٤.

[2] الانعام ١٦٥.

[3] مسلم/٤/٢١٠٩ ص٢٤.

[4] النباء ٣٨.

مەگین کەسێ لەلایەن خوداوە ئیزنی پێ درابێ. وەئەفەرموێت: ﴿ يَوْمَئِذٍ يَتَّبِعُونَ ٱلدَّاعِىَ لَا عِوَجَ لَهُۥ وَخَشَعَتِ ٱلْأَصْوَاتُ لِلرَّحْمَٰنِ فَلَا تَسْمَعُ إِلَّا هَمْسًا ﴾[1] لەبەر خودا هەموو دەنگێك نەوی دەبێ. چپە چپ نەبێ نابیسی. وە ئەفەرموێت: ﴿ يَوْمَ يَأْتِ لَا تَكَلَّمُ نَفْسٌ إِلَّا بِإِذْنِهِۦ ۚ فَمِنْهُمْ شَقِىٌّ وَسَعِيدٌ ﴾[2] ڕۆژێ کەدێ هیچ کەس بەبێ ئیزنی خودا قسە ناکا. لەناویاندا بەدبەخت و بەختەوەر هەن. زەحاك ئەڵێت لە ئیبنو عەباسەوە: ﴿ مَٰلِكِ يَوْمِ ٱلدِّينِ ﴾ خاوەنی ڕۆژی تۆڵەو پاداشتدانەوە ئەڵێت: هیچ کەسێ لەو ڕۆژەدا لەگەڵ خودا هیچ دەسەلآتێکی نیە و خاوەنی هیچ شتێك نیە،وەك لە دونیادا خاوەنی بون.

**ماناى ﴿يَوْمِ ٱلدِّينِ﴾**

ئیبنو عەباس ئەڵێت: ﴿يَوْمِ ٱلدِّينِ﴾ڕۆژی لێپرسینەوە لە دروستکراوەکان، کە ڕۆژی قیامەتە. پاداشتیان ئەداتەوە چاکە بە چاکەو خراپەیش بە سزا دان و تۆڵە لێسەندن جگە لەوەی کە عەفوی کردوە[3]. هاوەڵەکان و تابعین و پێشینەکانیش هەروایان وتوە.

**پاشاو پاشای پاشایان هەر خودایە**

لە ڕاستیدا پاشاو خاوەن دەسەلآت هەر خودای گەورەیە،خودای گەورە ئەفەرموێت: ﴿ هُوَ ٱللَّهُ ٱلَّذِى لَآ إِلَٰهَ إِلَّا هُوَ ٱلْمَلِكُ ٱلْقُدُّوسُ ٱلسَّلَٰمُ ٱلْمُؤْمِنُ ٱلْمُهَيْمِنُ ٱلْعَزِيزُ ٱلْجَبَّارُ ٱلْمُتَكَبِّرُ ۚ سُبْحَٰنَ ٱللَّهِ عَمَّا يُشْرِكُونَ ﴾[4] ئەو خودایە کەلەو بەدەر شیاوی پەرستن نیە پادشایە،پاك و بێعەیبەو سەرچاوەی هێمنایەتیە. وە لە هەردوو سەحیحەکەدا هاتوە لە ئەبو هورەیرەوە بە مەرفوعی: خراپترین ناو لەلای خودا پیاوێکە بە شاهەنشا ناو ببرێت،جگە لە خودا پادشا نیە[5]. وە دیسان لەهەردوو سەحیحەکەدا هاتوە لە ئەبو هورەیرەوە لە پێغەمبەری خوداوە(ﷺ) ئەفەرموێت: خودا زەوی دەگرێ و ئاسمانەکانیش بە دەستی ڕاستی دەپێچێتەوە پاشان ئەفەرموێت: منم پادشا، پادشاکان لە کوێن؟ دەسەلآت دارە بە زەبرەکان لە کوێن؟ خۆ بەزلزانەکان لە کوێن؟[6] وە لە قورئانی پیرۆزیشدا

---

[1] طه ١٠٨.

[2] هود ١٠٥.

[3] ابن ابی حاتم/١/١٩.

[4] الحشر ٢٣.

[5] فتح الباری/١/٦٠٤/، مسلم/١٦٨٨ ص.٢٤.

[6] فتح الباری /١٣/٤٠٤/، مسلم/٤/٢١٤٨.

ئەفەرموێت: ﴿يَوْمَ هُم بَٰرِزُونَ لَا يَخْفَىٰ عَلَى ٱللَّهِ مِنْهُمْ شَىْءٌ ۚ لِّمَنِ ٱلْمُلْكُ ٱلْيَوْمَ ۖ لِلَّهِ ٱلْوَٰحِدِ ٱلْقَهَّارِ﴾[1] لەو ڕۆژەدا فەرمان ڕەوایی بۆ کێیە ؟هەر بۆخودای تاك و تانیا، بەسەر هەموو شتا زاڵە. بەڵام ناوهێنانی غەیرەز خودا بە پاشا لەسەر شێوەی مەجازە وەك خودای گەورە ئەفەرموێت: ﴿وَقَالَ لَهُمْ نَبِيُّهُمْ إِنَّ ٱللَّهَ قَدْ بَعَثَ لَكُمْ طَالُوتَ مَلِكًا ۚ قَالُوٓا۟ أَنَّىٰ يَكُونُ لَهُ ٱلْمُلْكُ عَلَيْنَا وَنَحْنُ أَحَقُّ بِٱلْمُلْكِ مِنْهُ وَلَمْ يُؤْتَ سَعَةً مِّنَ ٱلْمَالِ ۚ قَالَ إِنَّ ٱللَّهَ ٱصْطَفَىٰهُ عَلَيْكُمْ وَزَادَهُۥ بَسْطَةً فِى ٱلْعِلْمِ وَٱلْجِسْمِ ۖ وَٱللَّهُ يُؤْتِى مُلْكَهُۥ مَن يَشَآءُ ۚ وَٱللَّهُ وَٰسِعٌ عَلِيمٌ﴾[2] خودا بۆ پادشایەتیتان تالوتی دیاری کردوە. وەئەفەرموێت: ﴿أَمَّا ٱلسَّفِينَةُ فَكَانَتْ لِمَسَٰكِينَ يَعْمَلُونَ فِى ٱلْبَحْرِ فَأَرَدتُّ أَنْ أَعِيبَهَا وَكَانَ وَرَآءَهُم مَّلِكٌ يَأْخُذُ كُلَّ سَفِينَةٍ غَصْبًا﴾[3] لە پشتیانەوە پادشایەك هەبوو. وە ئەفەرموێت: ﴿وَإِذْ قَالَ مُوسَىٰ لِقَوْمِهِۦ يَٰقَوْمِ ٱذْكُرُوا۟ نِعْمَةَ ٱللَّهِ عَلَيْكُمْ إِذْ جَعَلَ فِيكُمْ أَنۢبِيَآءَ وَجَعَلَكُم مُّلُوكًا وَءَاتَىٰكُم مَّا لَمْ يُؤْتِ أَحَدًا مِّنَ ٱلْعَٰلَمِينَ﴾[4] کە ئەو هەموو پێغەمبەرەی هەر لەناو خۆتان بۆ ناردون. چەندین پاشای لە ناو خۆتان بۆ پەیدا کردون وە لە هەردوو سەحیحەکەدا هاتووە: وێنەی پادشاکانت کەلەسەر ئەسیرەن[5].

### ئەفسیری ﴿الدِّينِ﴾

﴿الدِّينِ﴾ یانی: پاداشت و سزاو تۆڵە و لێپرسینەوە. وەك خودای گەورە ئەفەرموێت: ﴿يَوْمَئِذٍ يُوَفِّيهِمُ ٱللَّهُ دِينَهُمُ ٱلْحَقَّ وَيَعْلَمُونَ أَنَّ ٱللَّهَ هُوَ ٱلْحَقُّ ٱلْمُبِينُ﴾[6] لەو ڕۆژەدا خودا پاداشتی تەواویان بە ڕاستی ئەداتەوە. وە ئەفەرموێت: ﴿أَءِذَا مِتْنَا وَكُنَّا تُرَابًا وَعِظَٰمًا أَءِنَّا لَمَدِينُونَ﴾[7] هەر لێپرسینەوەیان لەگەڵدا دەکەن. وەلەم فەرمودەدا هاتووە: وشیار ئەوکەسەیە کەلێپرسینەوەی لەگەڵ خۆی کردوەو کاری بۆ پاش مردنی کردوە[8]. وەك عومەر ڕەزای خوای لێبێت ئەڵێت: لێپرسینەوە لەگەڵ خۆتان بکەن پێش ئەوەی

---

[1] غافر ١٦.
[2] البقرة ٢٤٧.
[3] الكهف ٧٩.
[4] المائدة ٢٠.
[5] فتح البارى/٦/٨٩/مسلم/٣/١٥١٨.
[6] النور ٢٥.
[7] الصافات ٥٣.
[8] ابن ماجة /٢/١٤٢٣/ لاوازە.

لێپرسینەوەتان لەگەڵدا بکرێ. خۆتان بکێشن پێش ئەوە کێشانە بکرێن. خۆیان ئامادە بکەن بۆ نمایشە هەرە گەورەکە لەلای ئەوکەسەکە ئاکارەکانی ئێوەی لاشاراوە نییە: ﴿يَوْمَئِذٍ تُعْرَضُونَ لَا تَخْفَىٰ مِنكُمْ خَافِيَةٌ﴾[1] ئەو ڕۆژە ئێوە ڕادەنێن و هەرچی بۆ شاردنەوەیە لە ئێوە حەشار نادرێ.

**﴿إِيَّاكَ نَعْبُدُ وَإِيَّاكَ نَسْتَعِينُ﴾ مانای عیبادەت لە زمان و شەرعدا**

عیبادەت لەزماندایانی ملکەچی. وەك دەڵێن ڕێگایەکی چاك کراوە(طريق معبد)، وە وشترێکی ڕام هێنراوە(بعير معبد)، عیبادەت لە شەرعیشدا: پێکهاتوە لەوەی کۆدەبێتەوە لە هەموو خۆشەویستی و ترس و ملکەچیەك بە تێرو تەواوی.

**سودەکانی پێشخستنی ئەو مەفعولەو گرنگی پێدانی**

ئەم مەفعولە کە ﴿إِيَّاكَ﴾یە پێش خراوە، دوبارەیش کراوەتەوە لە بەر گرنگی پێدان و دەست بەسەردا گرتن. واتە جگە لەتۆ هیچ کەس ناپەرستین پشت بەکەسیش نابەستین جگە لە تۆ. ئائەمە تەواوی خوا ناسیەو ئاین هەمووی دەگەڕێتەوە بۆ ئەم دوو مانایە. ئەمەش وەك ئەوە کە هەندێ زانایانی پێشینە وتویانە: فاتیحە نهێنی قورئانە. ڕازەکەیش ئەم وتەیە ﴿إِيَّاكَ نَعْبُدُ وَإِيَّاكَ نَسْتَعِينُ﴾ خودایە! تەنها تۆ دەپەرستین و تەنها لەتۆ داوای یارمەتی دەکەین. یەکەم دورە پەرێزیە لە شیرك و دورە پەرێزی لە هێزو دەسەڵات وئەملاولا گێڕانەوەی هەموو شتێ بۆ لای خودا. ئەم مانایە لە چەندین ئایەتا هاتوەلە قورئاندا وەك خودای گەورە ئەفەرموێت: ﴿وَلِلَّهِ غَيْبُ السَّمَاوَاتِ وَالْأَرْضِ وَإِلَيْهِ يُرْجَعُ الْأَمْرُ كُلُّهُ فَاعْبُدْهُ وَتَوَكَّلْ عَلَيْهِ ۚ وَمَا رَبُّكَ بِغَافِلٍ عَمَّا تَعْمَلُونَ﴾[2] سا تۆ هەر ئەو بپەرستەو چارەنوست هەر بە ئەو بسپێرە، هەر کارێ ئێوە دەیکەن، پەروەردگارت لە هیچی بێئاگا نیە. وە ئەفەرموێت: ﴿قُلْ هُوَ الرَّحْمَٰنُ آمَنَّا بِهِ وَعَلَيْهِ تَوَكَّلْنَا ۖ فَسَتَعْلَمُونَ مَنْ هُوَ فِي ضَلَالٍ مُّبِينٍ﴾[3] بڵێ: ئەوە خودای دڵاوا ﴿الرَّحْمَٰنِ﴾باوەڕمان پێهێناوە،خۆمان هەر بەو سپاردوە. وەئەفەرموێت: ﴿رَّبُّ الْمَشْرِقِ وَالْمَغْرِبِ لَا إِلَٰهَ إِلَّا هُوَ فَاتَّخِذْهُ وَكِيلًا﴾[4] پەروەردگاری خۆرهەڵات و خۆرئاوایە، جگە لەو هیچ شت بۆ پەرستن نابێ، هەر ئەو بە بریکار بگرە. ئەم ئایەتە پیرۆزەش هەروا ئەفەرموێت: ﴿إِيَّاكَ نَعْبُدُ وَإِيَّاكَ نَسْتَعِينُ﴾ خودایە! تەنها تۆ دەپەرستین و تەنیا لە تۆ

---

[1] الحاقة ١٨.

[2] هود ١٢٣.

[3] الملك ٢٩.

[4] المزمل ٩.

داوای یارمەتی دەکەین. ئەم وتەیە لە پاشملەوە گۆڕاوە بۆ ڕوو بەڕوو بەو (کاف) خیتابە، چونکە بەندە کاتێ ستایشی خودا دەکا وەك ئەوە وایە کە لێی نزیکەو لەبەر دەستی خودایە، بۆیە دەڵێ: ﴿إِيَّاكَ نَعْبُدُ وَإِيَّاكَ نَسْتَعِينُ﴾خودایە! تەنها تۆ دەپەرستین و تەنیا داوای یارمەتی هەر لەتۆ دەکەین.

**(الفاتحە) ڕێ نیشاندانە بۆ ستایش کردن، پێویستە خوێندنی لە نوێژدا**

ئەمە نیشانەی ئەوەیە کە سەرەتای سورەتەکەهەواڵێکە لەلایەن خوداوەلەسەر ستایش کردنی گیانی پیرۆزی خۆی بە جوانترین سیفەتەکانی خۆیی و شارەزاکردنی عەبدەکانی لەسەر بەجێ هێنانی ئەم ستایشە، هەر بۆیە هەرکەسێ ئەو ستایشە نەکا نوێژەکەی تەواو نابێ. وەك لەهەردوو سەحیحەکەدا هاتووە لە عوبادەی کوڕی سامیتەوە ئەڵێت: پێغەمبەری خودا(ﷺ) ئەفەرموێت: نوێژ نیە بۆ کەسێ کە فاتیحەی ئەم کتێبە نەخوێنێ[1] واتە: سوورەتی فاتیحە، وە لە سەحیحی موسلیمدا هاتووە لە ئەبو هورەیرەوە لە پێغەمبەری خوداوە(ﷺ)خودای گەورە ئەفەرموێت: نوێژم لەنێوان خۆم و بەندەکانمدا کردوەبە دوو بەشەوە، نیوەی بۆ من و نیوەی بۆ بەندەکەم،بەندەکەش داوای چی کرد ئەیدەمێ، هەر کاتێ بەندەکەم وتی: ﴿الْحَمْدُ لِلَّهِ رَبِّ الْعَالَمِينَ﴾ خودای گەورە ئەفەرموێت: بەندەکەم ستایشی کردم، هەرکاتێ وتی: ﴿مَالِكِ يَوْمِ الدِّينِ﴾ خودای گەورە ئەفەرموێت: بەندەکەم گەورەو مەزن سەیری کردم. وە کاتێ وتی: ﴿إِيَّاكَ نَعْبُدُ وَإِيَّاكَ نَسْتَعِينُ﴾ ئەمە لەنێوان من و بەندەکەمدایە،بەندەکەم چی بوێت بۆی دەکەم. کاتێ وتی: ﴿اهْدِنَا الصِّرَاطَ الْمُسْتَقِيمَ ۝٦ صِرَاطَ الَّذِينَ أَنْعَمْتَ عَلَيْهِمْ غَيْرِ الْمَغْضُوبِ عَلَيْهِمْ وَلَا الضَّالِّينَ﴾ڕێنمایمان بکە بۆ ڕێی ڕاست،ڕێگەی ئەوانەی کە چاکەت لەگەڵ کردون،نەك ڕێی ئەوانەی غەزەبی تۆیان لێگیراوە، وە نەك ڕێی گومڕایان. فەرموی: ئەمە تایبەتە بە بەندەکەم داوای چیش بکا بۆی دەکەم[2].

**تەوحیدی ئولوهیەت**

زەحاك لە ئیبنو عەباسەوە ڕەزای خوای لێبێت ئەڵێت: ﴿إِيَّاكَ نَعْبُدُ﴾واتە: خودایە! تەنیا هەر تۆ دەپەرستین و لە تۆ دەترسین و هیوامان هەر بە تۆیە نەك کەسی تر.

---

[1] فتح الباري/٢/٢٧٦، مسلم/١/٢٩٥ ص٢٥.

[2] مسلم/١/٢٩٧.

**تەوحیدی ڕوبیبەت**

﴿وَإِيَّاكَ نَسْتَعِينُ﴾ پشتیش هەر بەتۆ دەبەستین و گوێڕایەڵی هەر لەتۆ دەکەین لە گشت کارو بارێکماندا[1]. قەتادە ئەڵێت: ﴿إِيَّاكَ نَعْبُدُ وَإِيَّاكَ نَسْتَعِينُ﴾ خودای گەورە فەرمانتان پێدەکات بە دڵسۆزی بیپەرستن و لەهەموو کارێکتاندا پشت هەر بەئەو ببەستن[2]. بۆیە ﴿إِيَّاكَ نَعْبُدُ﴾ی پێش خستووە لە﴿وَإِيَّاكَ نَسْتَعِينُ﴾ چونکە خوا پەرستیەکە مەبەستە،پشت بەستنەکە هۆکارێکە بۆ ئەوە. گرنگی دان و لێبڕان بریتیە لە پێشخستنی گرنگ ترو پاشان گرنگ. و الله أعلم.

**ناونانی خودا پێغەمبەرەکەی بە بەندە لە بەرێزترین پلەو پایەکانە**

خودای گەورە ناوی پێغەمبەرەکەی(ﷺ) هێناوە بە بەندە، لە بەرێزترین پلەو پایەکانە. وەك ئەفەرموێت: ﴿الْحَمْدُ لِلَّهِ الَّذِي أَنْزَلَ عَلَى عَبْدِهِ الْكِتَابَ وَلَمْ يَجْعَلْ لَهُ عِوَجًا الْحَمْدُ لِلَّهِ الَّذِي أَنْزَلَ عَلَى عَبْدِهِ الْكِتَابَ وَلَمْ يَجْعَلْ لَهُ عِوَجًا﴾[3] ستایش بۆ ئەو خودایەی ئەم کتێبەی بۆ عەبدی خۆی ناردە خوارێ. وە ئەفەرموێت: ﴿وَأَنَّهُ لَمَّا قَامَ عَبْدُ اللَّهِ يَدْعُوهُ كَادُوا يَكُونُونَ عَلَيْهِ لِبَدًا﴾[4] لەو کاتەدا کە عەبدی خودا کە هەستا نوێژ بکا. وە ئەفەرموێت: ﴿سُبْحَانَ الَّذِي أَسْرَى بِعَبْدِهِ لَيْلًا مِنَ الْمَسْجِدِ الْحَرَامِ إِلَى الْمَسْجِدِ الْأَقْصَى الَّذِي بَارَكْنَا حَوْلَهُ لِنُرِيَهُ مِنْ آيَاتِنَا إِنَّهُ هُوَ السَّمِيعُ الْبَصِيرُ﴾[5] پاکی و بێعە یبی بۆ کەسێ لە شەوێکدا شەوڕەوی بە عەبدی خۆی کرد. کاتێ کە قورئانی بۆ نارد بە بەندە ناوی هێنا، وە لەکاتی بانگەوازا هەر بە بەندەی خۆی ناوی برد،وە لە شەو ڕەویەکەیشا هەر بە بەندە ناوی هێنا.

**ڕێنمایی کردن بۆ خودا ناسی لە کاتی دڵتەنگیدا**

ڕێنمایی کردنی پێغەمبەر(ﷺ) بۆ خوا پەرستی لەو کاتانەدا کە دڵی تەنگ دەبێ و دوژمنانی بڕوای پێ ناکەن،خودای گەورە ئەفەرموێت: ﴿وَلَقَدْ نَعْلَمُ أَنَّكَ يَضِيقُ صَدْرُكَ بِمَا يَقُولُونَ ﴿٩٧﴾ فَسَبِّحْ بِحَمْدِ رَبِّكَ وَكُنْ مِنَ السَّاجِدِينَ ﴿٩٨﴾ وَاعْبُدْ رَبَّكَ حَتَّى يَأْتِيَكَ الْيَقِينُ﴾[6] ئێمە ئاگامان لێهەیە کە تۆ لە قسەی ئەمانە

---

[1] ابن ابی حاتم/١/١٩.

[2] ابن ابی حاتم/١/٢٠.

[3] الکهف ١.

[4] الجن ١٩.

[5] الاسراء ١.

[6] الحجر ٩٧-٩٩.

دڵتەنگ دەبی. سا هەر ستایشی پەروەردگاری خۆت لە بیر بێ و لە ڕیزی سوجدە بەراندا بە. پەروەردگارت بپەرستە تا ئەو کاتەی مردن یەخەت پێدەگرێ.

**﴿ ٱهۡدِنَا ٱلصِّرَٰطَ ٱلۡمُسۡتَقِيمَ ﴾ نهێنی دواخستنی نزا دوای سوپاس و ستایش**

کاتێ لە پێشەوە باسی ستایشی بەرپرس کرا کە خودای گەورەیە، جێی خۆیەتی لە دوایدا داوا بکرێ وەك خودای گەورە ئەفەرموێت: (نیوەی بۆ من و نیوەشی بۆ بەندەکەمە، بەندەکەم داوای چی کرد ئەیدەمێ). ئەمە چاکترین حاڵەتی داواکەرە کە ستایشی بەرپەرسەکەی بکات و پاشان داوای پێویستی خۆیی و برا مسوڵمانەکانی بکات بلێ، وەك خودای گەورە ئەفەرموێت: ﴿ ٱهۡدِنَا ٱلصِّرَٰطَ ٱلۡمُسۡتَقِيمَ ﴾ ڕێنمایمان بکە بۆ ڕێی ڕاست. چونکە ئەو داواکردنە باشترو کاریگەر ترە بۆ قبوڵ بون و بەدەمەوە هاتن. هەر بۆیە خودای گەورە ڕێنمای بۆ کردوە،چونکە ڕێك و پێکتر و تەواو ترە. جاری وا هەیە ئەو داوایە بۆ هەواڵ دانە بە حاڵی ئەو کەسە کە پێویستی هەیەو داوا دەکات، وەك موساسەلامی خوای لێبێت فەرموی: ﴿ فَسَقَىٰ لَهُمَا ثُمَّ تَوَلَّىٰٓ إِلَى ٱلظِّلِّ فَقَالَ رَبِّ إِنِّي لِمَآ أَنزَلۡتَ إِلَيَّ مِنۡ خَيۡرٖ فَقِيرٞ ﴾[1] ئەی پەروەردگاری من! من بێنیاز نیم لە خێرەی کە بۆم دەنێری. جاری وایش هەیە وەسفی بەرپرسەکە پێش دەکەوێ لەگەڵ داواکەدا، وەك زەنون فەرموی: ﴿ وَذَا ٱلنُّونِ إِذ ذَّهَبَ مُغَٰضِبٗا فَظَنَّ أَن لَّن نَّقۡدِرَ عَلَيۡهِ فَنَادَىٰ فِي ٱلظُّلُمَٰتِ أَن لَّآ إِلَٰهَ إِلَّآ أَنتَ سُبۡحَٰنَكَ إِنِّي كُنتُ مِنَ ٱلظَّٰلِمِينَ ﴾[2] جگە لە تۆ هیچ خودایەك شك نابەم،پاکی و بێعەیبی بۆ تۆیە من لە ڕیزی ناهەقان بووم. جاری وایش هەیە هەر تەنیا ستایش بەرپرسە وەك ئەم شاعیرە دەڵێ:

أذكر حاجتي أم قد كفاني — حياءك إن شيمتك الحياء

إذا أثنى عليك المرء يوما — كفاه من تعرضه الثناء

واتە: ئایە من باسی پێویستی خۆم بکەم یان ئابڕوی تۆم بەسە کە ڕەوشتی تۆ هەر شەرمە. کاتێ کەسێ ڕۆژێ ستایشی تۆی کردبێ، بەسی برە ئیتر ستایش بکا.

**مانای شارەزابوون (الهدایە)**

(الهدایە) مەبەست پێی لێرەدا ڕێنیشاندان و پێ بەخشینە وەك خودای گەورە ئەفەرموێت: ﴿ ٱهۡدِنَا ٱلصِّرَٰطَ ٱلۡمُسۡتَقِيمَ ﴾ خودایە: شارەزامان بکە بۆ سەر ڕێی ڕاست، واتە: ڕێنمایمان بکە یان یارمەتیمان بدە

---

[1] القصص ٢٤.

[2] الانبياء ٨٧.

یان ڕێزیمان بده یان پێمان ببەخشه. وه ئەفەرموێت: ﴿وَهَدَيْنَٰهُ ٱلنَّجْدَيْنِ﴾[1] ڕێگەی هات و نەهاتیشمان نیشان داءیانی: ڕێگەی چاكەو خراپەمان ڕوون كردەوه. وه به (الی) چوەته سەری وەك ئەفەرموێت: ﴿شَاكِرًا لِّأَنْعُمِهِ ٱجْتَبَىٰهُ وَهَدَىٰهُ إِلَىٰ صِرَٰطٍ مُّسْتَقِيمٍ﴾[2] خوایش بۆ خۆی هەڵی بژاردو شارەزای ڕێگەی ڕاستی كرد. وه ئەفەرموێت: ﴿مِن دُونِ ٱللَّهِ فَٱهْدُوهُمْ إِلَىٰ صِرَٰطِ ٱلْجَحِيمِ﴾[3] ئەوسا ڕێگەی جەهەنەمیان پێنیشان دەن. ئەمەش بەمانای ڕێنیشاندانەو ڕێنمایی كردنه. وه ئەفەرموێت: ﴿وَكَذَٰلِكَ أَوْحَيْنَآ إِلَيْكَ رُوحًا مِّنْ أَمْرِنَا ۚ مَا كُنتَ تَدْرِى مَا ٱلْكِتَٰبُ وَلَا ٱلْإِيمَٰنُ وَلَٰكِن جَعَلْنَٰهُ نُورًا نَّهْدِى بِهِۦ مَن نَّشَآءُ مِنْ عِبَادِنَا ۚ وَإِنَّكَ لَتَهْدِىٓ إِلَىٰ صِرَٰطٍ مُّسْتَقِيمٍ﴾[4] تۆش لەسەر ڕاسته ڕێی،ڕێبەری. جاری واش هەیه بەلام چوەته سەری وەك قسەی ئەوانەی خەڵكی ناو بەهەشتن. وەك خودای گەورە ئەفەرموێت: ﴿وَنَزَعْنَا مَا فِى صُدُورِهِم مِّنْ غِلٍّ تَجْرِى مِن تَحْتِهِمُ ٱلْأَنْهَٰرُ ۖ وَقَالُوا۟ ٱلْحَمْدُ لِلَّهِ ٱلَّذِى هَدَىٰنَا لِهَٰذَا وَمَا كُنَّا لِنَهْتَدِىَ لَوْلَآ أَنْ هَدَىٰنَا ٱللَّهُ ۖ لَقَدْ جَآءَتْ رُسُلُ رَبِّنَا بِٱلْحَقِّ ۖ وَنُودُوٓا۟ أَن تِلْكُمُ ٱلْجَنَّةُ أُورِثْتُمُوهَا بِمَا كُنتُمْ تَعْمَلُونَ﴾[5] سوپاس بۆ ئەو خودایه كه ئێمەی هێنا بۆ ئێره. واته یارمەتی داین و شایستەی ئەم شوێنەی كردین كه بەهەشته.

### ماناى ﴿ٱلصِّرَٰطَ ٱلْمُسْتَقِيمَ﴾ ڕاسته ڕێ

دەربارەی ﴿ٱلصِّرَٰطَ ٱلْمُسْتَقِيمَ﴾ ئیمام ئەبو جەعفەری كوڕی جەریرئەڵێت: زانایانی تەفسیری ئەم ئومەته كۆ دەنگن لەسەر ئەوه كه ڕاسته ڕێ ئەو ڕێگه ڕوون و ئاشكرایه كه لارو خێچی تێدا نیه، ئەمەیش له زمانی گشت عەرەبەكاندا هاتووه. لەوانه قسەی جەریری كوڕی عەتیەی خەتەفی كه لەم دێره شعرەدا وتویەتی:

أمير المؤمنين على الصراط إذا أعوج الموارد مستقيم[6]

نمونه ئەوەنده زۆره لەم بارەیەوەله ژماره نایەت،عەرەبەكان وتەی (ٱلصِّرَٰطَ)یان هێناوەو بەكاریان هێناوه بۆ هەموو كارێ به ڕاست یان به چەوت وەسف كرابێ،وەسفی ڕاستی به پایەداری و لاریش به

[1] البلد ١٠.
[2] النحل ١٢١.
[3] الصافات ٢٣.
[4] الشوراء ٥٢.
[5] الاعراف ٤٣.
[6] الطبری /١/١٧٠ ص٢٦.

چەوت کردوە. مەبەستیش پێی ئەم ئیسلامەیە. ئیمامی ئەحمەد ڕیوایەتی کردوەلە نەواسی کوڕی سەمعانەوە لە پێغەمبەری خوداوە(ﷺ) فەرموی: خودا نمونەیەکی هێناوەتەوە کە ڕاستە ڕێیە ( ٱلصِّرَٰطَ ٱلْمُسْتَقِيمَ)لە تەنیشتی ئەو ڕێگەیە دوو شورا (دیوار) هەیە دەرگای کراوەیان تێدایە، لەسەر دەرگاکان چەندین پۆشاکی نەرم وتەنك هەیە،وە لەسەر دەرگای ڕێگەکە بانگخوازێ دەڵێ: ئەی خەڵکینە هەموو بچنە سەر ئەم ڕێگەیە و لارو چەوت مەبنەوە،بانگخوازێکیش بانگەواز دەکالەسەری ڕێگەکەوە،کاتێ مەردمێ ویستی هەندێ لەو دەرگانە بکاتەوە دەڵێ: هاوار لە تۆ،نەیکەیتەوە،ئەگەر کرتەوە دەچیتە ناوی، ئەم ڕێگەیە ئیسلامەو دوو دیوارەکەیش سنورەکانی خودایە، دەرگا کراوەکانیش قەدەغەکراوەکانی خودایە. وە ئەو بانگخوازەش کە لەسەر ڕێگەکەیە کتێبی خودایە ئەو بانگخوازەش کە لەسەرەوەی ڕێگەکەیە، ئامۆژگاری کەری خودایە لەناو دڵی گشت مسوڵمانێکدا[1].

**داوای بڕوادار لە خودا بۆ ڕێ نیشاندان لەگەڵ ئەوەیشا کە ڕێنمایی کراوە**

ئەگەر بوترێ چۆن خاوەنباوەڕداوای ڕێنیشاندان دەکا لە هەموو کاتێکا و لە کاتی نوێژەکاندا و جگە لە نوێژەکانیشدا، کە بە خاوەنباوەڕ هەژمار کراوە؟ئایا ئەمە لە بابی وەدی هێنانا شتێکە کە وەدی هاتووە یان نا؟ وەڵامەکەی نەخەیەر. خۆ ئەگەر خاوەنباوەڕ بەشەوو بە ڕۆژ پێویستی بەداوای ڕێنمایی نەبوایە، خودا ڕێی نیشان نەدا بۆ ئەوە. چونکە بەندە هەمیشە نیازی بە خودای گەورە هەیە کە ڕاوەستاوی بکا لەسەر ڕێگەی ڕاست و شارەزا بون لێی بە چاکی و ووردی و چاوڕۆشنی و زیاتر ئاگادار بوون و بەردەوامی لەسەری،چونکە عەبد هیچی لەدەست نایە بۆ خۆی لە سوودو زیان مەگین خودا مەیلی لێبێ و شارەزای بکا کە هانای بۆ بەرێ و داوای لێبکا لە هەموو کاتێکا یارمەتی بداو ڕاوەستاوی بکاو سەرکەوتووی بکات. بەختەوەر ئەو کەسەیە کە خودا یارمەتی بدا داوای لێبکات، چونکە خودای گەور بەڵێنی وەڵام دانەوەی داوە بەو کەسانە کە داوای لێدەکەن بە تایەبەتی لە کاتی پێویستی و تەنگانەو داماویدا لە هەموو کاتێکی شەوو ڕۆژدا. خودای گەورە ئەفەرموێت: ﴿يَٰٓأَيُّهَا ٱلَّذِينَ ءَامَنُوٓاْ ءَامِنُواْ بِٱللَّهِ وَرَسُولِهِۦ وَٱلْكِتَٰبِ ٱلَّذِى نَزَّلَ عَلَىٰ رَسُولِهِۦ وَٱلْكِتَٰبِ ٱلَّذِىٓ أَنزَلَ مِن قَبْلُ ۚ وَمَن يَكْفُرْ بِٱللَّهِ وَمَلَٰٓئِكَتِهِۦ وَكُتُبِهِۦ وَرُسُلِهِۦ وَٱلْيَوْمِ ٱلْءَاخِرِ فَقَدْ ضَلَّ ضَلَٰلًۢا بَعِيدًا﴾[2] ئەی کۆمەڵی خاوەنباوەڕان! لەگەڵ ئەوەی بڕواتان بە خودا هێناوە، دەبێ بڕواتان بە پێغەمبەرەکەی هەبێ، وە بڕواتان بەو قورئانە هەبێ بۆ پێغەمبەری ناردوە، بڕواتان بەو کتێبەش هەبێ کە پێش لە قورئان ناردوویە. خودای گەورە فەرمانی داوە کە بڕوایان بە خوداو پێغەمبەرەکانی هەبێ و بەردەوام لەسەری ڕاوەستن و ئەو کارانەی

---

[1] أحمد /١٨٢/٤ فەرمودەیەکی باشە(جيد).

[2] النساء ١٣٦.

کە پێیان سپێراوە بەجێی بێنن و الله أعلم. ئەمە لە بابی وەدی هێنانی شتێ نیە کە پێی هەڵساون. وە خودا فەرمانی داوە بە عەبدە بڕوادارەکانی کە بڵێن: ﴿رَبَّنَا لَا تُزِغْ قُلُوبَنَا بَعْدَ إِذْ هَدَيْتَنَا وَهَبْ لَنَا مِن لَّدُنكَ رَحْمَةً إِنَّكَ أَنتَ الْوَهَّابُ﴾[1] ئەی پەروەردگاری هەموومان! لەپاش ئەوەی ڕێگەی ڕاستت نیشان داوین،دڵمان لە ڕێی خۆت لامەدەو وە بەر بەزەیی خۆتمان بخە، بەخشندەی هەرە گەورە تۆی. ئەمە مانای ئەم ئایەتەیە کە خودای گەورە ئەفەرمویت: ﴿اهْدِنَا الصِّرَاطَ الْمُسْتَقِيمَ﴾ واتە: خودایە! شارەزامان بکە لەسەر ڕێی ڕاست و بەردەوامان بکە لە سەری و لامان مەدە بۆ ڕێگەیەکی تر.

﴿صِرَاطَ الَّذِينَ أَنْعَمْتَ عَلَيْهِمْ غَيْرِ الْمَغْضُوبِ عَلَيْهِمْ وَلَا الضَّالِّينَ﴾

ڕێگەی ئەوانەی کە چاکەت لەگەڵ کردون،نەك ڕێگەی ئەوانەی بەر تورەیی کەوتون ونەك ئەوانەش کەلاڕێ بوون. لەپێشەوە قسەلەسەر ئەوەکرا کە بەندە دەڵێ: ﴿اهْدِنَا الصِّرَاطَ الْمُسْتَقِيمَ﴾ خودایە! ڕێنمایمان بکە بۆ ڕێی ڕاست. تا دواییەکەی کە خودای گەورە ئەفەرمویت: ئەمە بۆ بەندەکەمە، هەرچی داوا بکا پێی ئەدەم. پاشان ئەفەرمویت: ﴿صِرَاطَ الَّذِينَ أَنْعَمْتَ عَلَيْهِمْ﴾ ڕێگای ئەوانەی چاکەت لەگەڵ کردون. ئەمەتەفسیری ﴿الصِّرَاطَ الْمُسْتَقِيمَ﴾ کە بەدەلە لەلای نەحویەکان. عەتفە بەیانیش بێ هەر دروستە والله أعلم. ئەوانەی کە خودا چاکەی لەگەڵ کردون. ئەو کەسانەن کە لە سورەتی نیسائداناویان هاتووە. وەك خودای گەورە ئەفەرمویت: ﴿وَمَن يُطِعِ اللَّهَ وَالرَّسُولَ فَأُولَٰئِكَ مَعَ الَّذِينَ أَنْعَمَ اللَّهُ عَلَيْهِم مِّنَ النَّبِيِّينَ وَالصِّدِّيقِينَ وَالشُّهَدَاءِ وَالصَّالِحِينَ ۚ وَحَسُنَ أُولَٰئِكَ رَفِيقًا (٦٩) ذَٰلِكَ الْفَضْلُ مِنَ اللَّهِ ۚ وَكَفَىٰ بِاللَّهِ عَلِيمًا﴾[2] هەرکەسێ بەر فەرمانی خوداو ئەم پێغەمبەرە بێ، دەبێتە هاوڕێی ئەوانەی کەخودا چاکەی لەگەڵ کردون، لە ڕیزی پێغەمبەران و خودا پەرستانی ڕاستی و شەهیدان و پیاو چاکەکان،چ هاوڕێیانی چاکیشن ئەمانە. پاشان خودای گەورە ئەفەرمویت: ﴿غَيْرِ الْمَغْضُوبِ عَلَيْهِمْ وَلَا الضَّالِّينَ﴾ نەك ڕێگەی ئەوانەی بەر تورەیی کەوتون، نەك ئەوانەش کە لاڕێ و گومڕا بوون. یانی: ئەی خودایە! ڕێمایمان بکە بۆ سەر ڕێی ڕاست، ڕێی ئەوانەی کە چاکەت لەگەڵ کردون. ئەوانەی کە لە پێشەوە باسیان کراکە شایستەی ئەو ڕێنماییەبوون و ڕاوەستاو بوون لەسەر گوێڕایەڵی خوداو پێغەمبەرەکەی و فەرمانەکانیان بەجێ هێناو دورکەوتنەوە لە قەدەغە کراوەکانی و نەکەوتنە سەر

[1] ال عمران ٨.

[2] النساء ٦٩-٧٠.

ڕێگەی ئەوانەی کە بەر توڕەیی خودا کەوتن، ئەوانەی کە بیرو ڕایان بەدو ناڕەوا بوو، هەقیان بۆ دەرکەوت بەلاَم لایاندا لێی،ڕێگەی ئەوانەش نا کە گومڕا بوون و ڕێیان وون کرد لە گومڕایدا دەهاتن و دەچون و ڕێگەی هەقیان دەر نەدەکرد. بە وتەی (لا) جەخت لەسەری دەکاتەوە، تا دەرکەویّ کە ئەوە دوو ڕێگەی زۆر خراپن کە ڕێگەی جولەکەو گاورەکانە، تا لێیان دوور کەونەوە. چونکە ڕێگەی خاوەنباوەڕان بریتیە لە شارەزایی لە هەق و کارکردنە بە هەق. دیارە جوولەکە کارکردنیان بە هەق ون کرد،گاورەکانیش زانستیان لەدەست دا هەر بۆیە جوولەکە بەر خەشم و توڕەیی کەوتن و گاوریش گومڕابوون و لاڕێیان گرت. چونکە هەرکەسیّ شارەزای هەق بوو پاشان وازی لێهێنا شایەنی توڕەیی و خەشم و قینە. بە پێچەوانەی ئەوانەی کە شارەزا نیە، گاورەکان هەرچەندە نیازی شتێکیان بووە بەلاَم ڕێگاکەیان دەرنەکردچونکە لە ڕێگەی خۆیەوە بۆی نەچوون،کە شوێن کەوتنی هەقە،وێلّ و گومڕا بوون، ئەوسا گاورو جولەکە هەردوکیان وێلّ و گومڕاو بەر توڕەیی و خەشم و قین کەوتن. بەلاَم خەشم و قینەکە تایەبەتە بە جوولەکە، وەسفی ئەوانی پێکراوە، وە خودای گەورە دەربارەیان ئەفەرموێت: ﴿قُلْ هَلْ أُنَبِّئُكُم بِشَرٍّ مِّن ذَٰلِكَ مَثُوبَةً عِندَ اللَّهِ ۚ مَن لَّعَنَهُ اللَّهُ وَغَضِبَ عَلَيْهِ وَجَعَلَ مِنْهُمُ الْقِرَدَةَ وَالْخَنَازِيرَ وَعَبَدَ الطَّاغُوتَ ۚ أُولَٰئِكَ شَرٌّ مَّكَانًا وَأَضَلُّ عَن سَوَاءِ السَّبِيلِ﴾[1] کەسانێکیش بەر نەفرینی خودا کەوتن و خودا غەزەبی لێگرتن.

وە تایەبەتترین وەسفی گاوریش گومڕا بوونە. وەك خودای گەورە دەربارەیان دەفەرموێت: ﴿قُلْ يَا أَهْلَ الْكِتَابِ لَا تَغْلُوا فِي دِينِكُمْ غَيْرَ الْحَقِّ وَلَا تَتَّبِعُوا أَهْوَاءَ قَوْمٍ قَدْ ضَلُّوا مِن قَبْلُ وَأَضَلُّوا كَثِيرًا وَضَلُّوا عَن سَوَاءِ السَّبِيلِ﴾[2] پێش لە ئێستا گومڕا بوون و زۆرێکیشیان گومڕا کردوو خۆشیان لە ڕێی ڕاست لایاندا. هەربۆیە چەندین فەرمودەو ئاسار لەو بارەیەوە هاتووە و ڕوون و ئاشکرایە.

ئیمامی ئەحمەد ڕیوایەتی کردووە لە عەدی کوڕی حاتەمەوە وتی: سوارەی پێغەمبەری خودا(ﷺ) پورم و چەند کەسێکیان گرت، کاتیّ کە هێنایانن بۆ لای پێغەمبەری خودا(ﷺ) ڕیزیان کردن بۆی پوری عەدی وتی: ئەی پێغەمبەری خودا(ﷺ)! نوێنەرەکەم دورەو، مندالّم نەماوە، من پیرژنێکی بەتەمەنم، کەسم نیە ئیش و کارێکم بۆ بکا. چاکەم لەگەلّبکە، خودا چاکەت لەگەلّ بکا. پێغەمبەری خودا(ﷺ) فەرموی: نوێنەرەکەت کامەیە؟ ووتی: عەدی کوڕی حاتەمە، فەرموی: ئەو کەسەی لە خوداو پێغەمبەرەکەی(ﷺ) ڕایکردو هەلاّت. وتی: چاکەی لەگەلّ کردم، کاتیّ کە عەدی گەڕایەوە پیاویّ لە تەنیشتی بوو لە عەلی دەکرد وتی: داوای ولاّخێکی سواری لێبکە، ئەویش داوای کرد،پێغەمبەر

---

[1] المائدة ٦٠.

[2] المائدة ٧٧.

(ﷺ) فەرمانی دا پێی بدەن. وتی: هات بۆ لام و وتی: کارێکی وای کردوە باوکت هەرگیز کاری وای نەکردوە. ئەو فلان هاتە لای و تووش چاکە بوی لێی،فلانیش هاتە لای و تووشی بوو فێربوو لێی. عەدیش وتی: منیش چوم بۆلای ژنێك و چەند مندالێکی لەلا بوو. باسی نزیکیانی کردن لە پێغەمبەرەوە(ﷺ) ئالەوێدا زانیم پادشایەك نیە وەك کیسراو قەیسەر، فەرموی: ئەی عەدی چی ڕاوی نای لەوەی کە دەوترێ: لا إله إلا الله؟ ئایا هیچ پەرستراوێ هەیە جگە لە خودا؟ چی ڕاوی نای لەوەی کە دەوترێ: الله أکبر؟ ئایا شتێ هەیە لە خودای گەورە گەورەتر بێت؟ وتی: مسولمان بووم. بینیم ڕوی گەشایەوەو فەرموی: ئەوانەی غەزەبیان لێگیراوە جوولەکەکانن و کومڕاکانیش مەسیحیەکانن، پاشان ئەم فەرمودەی باسکرد. ترمزیش ڕیوایەتی کردوەو وتی فەرمودەیەکی حەسەنی غەریبە[1]. وە لە سیرەدا هاتووە لە زەیدی کوڕی عەمری کوڕی نوفەیلەوە کاتێ خۆی هەندێ لە هاوەڵەکانی ڕۆشتنبۆ شام دەگەڕان بە شوێن ئاینی ڕاست و ڕوندا. جوولەکەکان پێیان ووت: تۆ ناتوانی بێیتە ناومان تا بەشێك لە غەزەبی خودا هەڵ نەگری، وتی: من لە غەزەبی خودا ڕادەکەم، مەسیحیەکان پێیان ووت: تۆ ناتوانی بێیتە ناومان تا بەشێك لە ناڕەزایی خودا وەرنەگری، وتی: ئەوە لە توانای مندا نیە، لەسەر سروشتی خۆی مایەوە، دورکەوتەوە لە پەرستن و ئاینی بتپەرستان، نەچوە لای هیچ کەسێ لە گاورو جولەکەکان. بەڵام هاوەڵانی بوونە مەسیحیی و چونە ناو ئاینی مەسیحیەکان. چونکە ویانزانی لە ئاینی جوولەکەوە نزیکە لەو سەردەمەدا. یەکێ لەوانە وەرەقەی کوڕی نەوفل بوو. تا ئەوکاتەی کە خودا شارەزای کرد کە پێغەمبەر(ﷺ) هات، باوەڕە هێنا کاتێ کە بینی نیگای بۆ هات ڕەزای خوای لێبێت.

## پێکهاتەکانی سورەتی فاتیحە

ئەم سورەتە پیرۆزە لە حەوت ئایەت پێك هاتووە کە بریتیە لە سوپاس و ستایشی خودای گەورە بە ناوە پیرۆزەکانی کە پەیوەندە بە سیفەتە بەرزەکانییەوە،وە باسی ڕۆژی دوایی کە ڕۆژی قیامەتە و باسی ڕێنماییەکانی بەندەکانی بۆ پاڕانەوە و لالانەوە لێی و دەربڕینی لاوازی و بێدەسەڵاتیان و بە سۆزیان لە پەرستنیداو ناسینی بە تاك و تەنیا کە شەریك و هاوتای نیە و پاك و بێعەیبەو دورە لە گشت کەموکوڕیەك وهانا پێبردنی بۆ ڕێنمایی کردنیان بۆ سەر ڕێی ڕاست کە ئەم ئاینە پایە دارەیە کە ڕاوەستاویان بکات لە سەری و یارمەتیان بدا بۆ بڕینی ئەو ڕێگە هەستیارە لە ڕۆژی قیامەتدا و بیان گەیەنێت بە بەهەشتی بەرین. لە تەنیشت پێغەمبەران و خواپەرستانی ڕاست و شەهیدان و پیاو چاکان، وە ئەم سورەتە پێك هاتووە لە هەڵنانی خاوەنباوەڕان بۆ ئاکاری چاك تا لەگەڵ ئاکار چاکاندا بن لە ڕۆژی قیامەتدا. وە ئاگادار کردنەوە و ترساندن لە دورکەوتنەوە لە ڕێگە خراپ و پڕو پوچەکان،

---

[1] أحمد /٤/٣٧٨، تحفة الاحوذی/٨/٢٨٩ ص٢٧.

تا لە ڕۆژی قیامەتا لەگەڵ ئەو کەسانەدا کۆنەکرێنەوە و ڕاپێچ نەکرێن بۆ ناو ئاگر لە ڕۆژی قیامەتدا، ئەوانەی کە غەزەبیان لێگیراوە وێڵ و گومڕا بوون.

**دانە پاڵی بەهرەکان ئەلای خوداو نەدانە پاڵی گومڕایی ئەلای خوداو وەڵام دانەوەی قەدەریەکان**

چەندچاك و جوانە دانەپاڵی بەهرەکان ئەلای خودا لەم ئایەتەدا کەخودای گەورەئەفەرموێت: ﴿صِرَٰطَ ٱلَّذِينَ أَنۡعَمۡتَ عَلَيۡهِمۡ﴾ فاعیلەکەی بواردوە لە الغضب دا، کە ئەفەرموێت: ﴿غَيۡرِ ٱلۡمَغۡضُوبِ عَلَيۡهِمۡ﴾ هەرچەند لە هەقیقەتدا خۆی کارایە و هەموو شتیّ بەویستی خۆیەتی. وەك لە ئایەتێکی تردا ئەفەرموێت: ﴿أَلَمۡ تَرَ إِلَى ٱلَّذِينَ تَوَلَّوۡاْ قَوۡمًا غَضِبَ ٱللَّهُ عَلَيۡهِم مَّا هُم مِّنكُمۡ وَلَا مِنۡهُمۡ وَيَحۡلِفُونَ عَلَى ٱلۡكَذِبِ وَهُمۡ يَعۡلَمُونَ﴾[1] ئایە تۆ ئەوانەت نەدی کە بوونە دۆستی ئەوانەی کە خوا غەزەبی لێگرتوون. وە دیسان گومڕایشی داوەتە پاڵ ئەوانەی کە پێی هەڵدەستن. هەرچەندە خودا خویشی گومڕای کردوون. وەك ئەفەرموێت: ﴿وَتَرَى ٱلشَّمۡسَ إِذَا طَلَعَت تَّزَٰوَرُ عَن كَهۡفِهِمۡ ذَاتَ ٱلۡيَمِينِ وَإِذَا غَرَبَت تَّقۡرِضُهُمۡ ذَاتَ ٱلشِّمَالِ وَهُمۡ فِي فَجۡوَةٖ مِّنۡهُۚ ذَٰلِكَ مِنۡ ءَايَٰتِ ٱللَّهِۗ مَن يَهۡدِ ٱللَّهُ فَهُوَ ٱلۡمُهۡتَدِۖ وَمَن يُضۡلِلۡ فَلَن تَجِدَ لَهُۥ وَلِيّٗا مُّرۡشِدٗا﴾[2] هەرکەس خودا شارەزای بکات،ئەوە شارەزا دەبێت و هەرکەسیش گومڕا بکات، دۆستێکی ڕێنیشاندەری بۆ پەیدا ناکرێ. وە ئەفەرموێت: ﴿مَن يُضۡلِلِ ٱللَّهُ فَلَا هَادِيَ لَهُۥۚ وَيَذَرُهُمۡ فِي طُغۡيَٰنِهِمۡ يَعۡمَهُونَ﴾[3] خودا ڕێ لەهەر کەس بگرێ، هیچ ڕێبەری دەست ناکەوێ خودا وازیان لێدێنێ با هەر لەیاخی بوونی خۆیاندا سەرگەردان بن. چەندین ئایەتی تریش هاتووە کە خودای گەورە هەر خۆی شارەزا دەکات و گومڕاش دەکات. نەك وەك ئەوەی قەدەریەکان ئەوانەی وەك ئەوان بیردەکەنەوە دەڵێن: عەبدەکان خۆیان ئەوە هەڵدەبژێرن و دەیکەن، بەڵگەشیان لەسەر ئەو قسەیان ئایەتە لەیەکچوەکانی قورئانە. واز لەو ئایەتانە دێنن کە بەئاشکراو ڕوون وەڵامیان ئەداتەوە، ئەمەش حاڵ و بەرخوردی خەڵکی گومڕاو یاخیە. وە لە فەرمودەی سەحیحدا هاتووە: کاتێ ئەوانەتان بینی کە دوای ئەو ئایەتانە دەکەون کەمانای جۆراو جۆر هەڵدەگرن،ئەوانە ئەو کەسانەن کە خودای گەورە ناوی بردوون خۆتانیان لێبپارێزن[4]. ئەمە مانای ئەو ئایەتەیە کە خودای گەورە ئەفەرموێت: ﴿هُوَ ٱلَّذِيٓ أَنزَلَ عَلَيۡكَ ٱلۡكِتَٰبَ مِنۡهُ ءَايَٰتٞ مُّحۡكَمَٰتٌ هُنَّ أُمُّ ٱلۡكِتَٰبِ وَأُخَرُ مُتَشَٰبِهَٰتٞۖ فَأَمَّا ٱلَّذِينَ فِي قُلُوبِهِمۡ زَيۡغٞ فَيَتَّبِعُونَ مَا تَشَٰبَهَ مِنۡهُ ٱبۡتِغَآءَ ٱلۡفِتۡنَةِ وَٱبۡتِغَآءَ تَأۡوِيلِهِۦۗ وَمَا يَعۡلَمُ تَأۡوِيلَهُۥٓ إِلَّا ٱللَّهُۗ

---

[1] المجادلة ١٤.

[2] الكهف ١٧.

[3] الاعراف ١٨٦.

[4] فتح الباری /٨/٥٧ ص٢٧.

وَٱلرَّٰسِخُونَ فِي ٱلۡعِلۡمِ يَقُولُونَ ءَامَنَّا بِهِۦ كُلّٞ مِّنۡ عِندِ رَبِّنَاۗ وَمَا يَذَّكَّرُ إِلَّآ أُوْلُواْ ٱلۡأَلۡبَٰبِ هُوَ ٱلَّذِيٓ أَنزَلَ عَلَيۡكَ ٱلۡكِتَٰبَ مِنۡهُ ءَايَٰتٞ مُّحۡكَمَٰتٌ هُنَّ أُمُّ ٱلۡكِتَٰبِ وَأُخَرُ مُتَشَٰبِهَٰتٞۖ فَأَمَّا ٱلَّذِينَ فِي قُلُوبِهِمۡ زَيۡغٞ فَيَتَّبِعُونَ مَا تَشَٰبَهَ مِنۡهُ ٱبۡتِغَآءَ ٱلۡفِتۡنَةِ وَٱبۡتِغَآءَ تَأۡوِيلِهِۦۗ وَمَا يَعۡلَمُ تَأۡوِيلَهُۥٓ إِلَّا ٱللَّهُۗ وَٱلرَّٰسِخُونَ فِي ٱلۡعِلۡمِ يَقُولُونَ ءَامَنَّا بِهِۦ كُلّٞ مِّنۡ عِندِ رَبِّنَاۗ وَمَا يَذَّكَّرُ إِلَّآ أُوْلُواْ ٱلۡأَلۡبَٰبِ ﴾[1] ئەو کەسانەی دڵیان دەغەزی تێدایە،هور ئەوانە حەز لێدەکەن کە خەڵکی پێهەڵدەخەڵەتێ و هەرچۆنێ دڵیان دەیەوێ مانایان لێك ئەدەنەوە. سوپاس بۆ خودای گەورە هیچ بەڵگەیەکی ڕاست نیە بەدەست ئەو بیدعە چیانەوە لە قورئاندا، چونکە قورئان هاتووە بۆ ئەوەی هەق لە بەتاڵ جیا بکاتەوە،شارەزایی و گومڕایی لە یەك هەڵاوێرێ. هیچ دژایەتی و هەڵوەشاندنەوەیەك لە قورئاندا نیە،چونکە لەلایەن خودای کارزان و ستایش کراوەوە ڕەوانە کراوە.

## ئامین کردن لە دوای خوێندنی فاتیحە

سونەتەکەسێ کەفاتیحەی خوێند لەدوایدا بڵێ: (آمین) وەك یاسین، وە بە (آمین) خوێنراوەتەوە. یانی: ئەی خودایە! لێمان قبوڵ بکە. بەڵگەیش لەسەر سونەتی ئامین کردن،ئەم فەرمودەیە کە ئیمامی ئەحمەدو ئەبو داودو تیرمیزی ڕیوایەتیان کردوە لە وائیلی کوڕی حجرەوە ئەڵێت: بیستم لە پێغەمبەری خوداوە(ﷺ) کە ﴿غَيۡرِ ٱلۡمَغۡضُوبِ عَلَيۡهِمۡ وَلَا ٱلضَّآلِّينَ﴾ی دەخوێند، ئامینی دەکرد،دەنگی تیا درێژ دەکردەوە[2]. ئەبو داود ئەڵێت: دەنگی تیا درێژ دەکردەوە. تیرمزی ئەڵێت: فەرمودەیەکی حەسەنە. وە لە عەلی و ئیبنو مەسعودو کەسانی تریشەوە ڕیوایەت کراوە[3]. وە لە ئەبو هورەیرەوە ئەڵێت: پێغەمبەری خودا ئەگەر ﴿غَيۡرِ ٱلۡمَغۡضُوبِ عَلَيۡهِمۡ وَلَا ٱلضَّآلِّينَ﴾ی بخوێندایە ئەیفەرموو ئامین تا ئەوانەی لە دوایەوە بوون لە ڕیزی یەکەمدا دەیبیست[4]. ئەبو داودو ئیبنو ماجەش ڕیوایەتیان کردوەئەمەیان بۆ زیاد کردوە، بەو ئامینە مزگەوت دەلەرزیەوە[5]. دارەقوتنی ئەڵێت: ئەم فەرمودە سەنەدەکەی حەسەنە[6]. وە لە بیلالەوە ئەڵێت: یارسول الله لاتسبقنی بامین، ئەبو داود ڕیوایەتی کردووە[7]. ئەبو نەسری توشەیری هێناویەتی لە حەسەن و جەعفەری سادیقەوەکە هەردوکیان میمیان

---

[1] ال عمران ٧.

[2] أحمد/٤/٣١٥/، أبو داود/١/٥٧٤/، تحفة الاحوذی /٢/٦٥ ص٢٨ سەحیحە.

[3] تحفة الاحوذی /٢/٦٧.

[4] أبو داود/١/٥٧٥، بەم شێوەیە لاوازە.

[5] أبو داود/١/٥٧٥/، ابن ماجة /١/٢٧٩/، بەم شێوەیە لاوازە.

[6] الدار قطنی /١/٣٣٥.

[7] أبو داود /١/٥٧٦/ لاوازە.

تەشدید کردوە لە (آمین)دا وەك تزامنك البیت الحرام، وتی: هاوەڵەکانمان و کەسانی تریش وتویانە: ئەم ئامین کردنە لە دەرەوەی نوێژیشدا هەر سونەتە. بەڵام دەربارەی نوێژ خوێن جەختی لەسەر کراوەتەوە. بەتەنیا نوێژ بکات یان پێش نوێژ بێ یان لە دوای پێش نوێژەوە بێ وەك یەکە. وە لەهەموو کاتێکیشدا. وەك لەهەردوو سەحیحەکەدا هاتووە لە ئەبو هورەیرەوە کە پێغەمبەری خودا(ﷺ) ئەفەرموێت: ئەگەر پێش نوێژ ئامینی کرد ئێوەش بیکەن هەرکامتان ئامینەکەی لەگەڵ ئامینی فریشتەکاندا یەك بگرێ خودا لە گوناهی ڕابردووەکانی خۆش دەبێ[1]. موسلیمیش هێناویەتی کە پێغەمبەری خودا(ﷺ) ئەفەرموێت: کەتێ کەسێ لە ئێوە لە نوێژدا وتی ئامین،فریشتەکانیش وتیان (آمین)، ئامینەکانیان ڕێکەوتی یەکتری کرد خودا لە گوناهە ڕابردوەکانی خۆش دەبێ[2]. وتراوە: بەو مانایە کەسێ ئامینەکەی ڕێکەوتی ئامینی فریشتەکان کەوت لەیەك کاتدا. وە وتراوە: لەکاتی وەڵام دانەوەدا. وتراوە: لە کاتی دڵپاکی و دڵسۆزیدا. وە لە سەحیحی موسلیمدا هاتووە لە ئەبو موساوە بە مەرفوعی: ئەگەر ئیمام وتی: ولا الضالین ئێوەش بڵێن: ئامین خودا وەڵامتان ئەداتەوە[3]. تیرمیزی ئەڵێت: یانی ئەی خودایە! هیوا بڕاومان مەکە لە داواکانماندا. زۆرێکی تریش وتویانە، یانی: ئەی خودایە داواکەمان لێوەر بگرە.

## تەفسیری سورەتی (بەقەرە)

### لە مەدینەدا هاتۆتە خوارەوە

### باسی ئەو فەرمودانەی دەربارەی ڕێزی سورەتی بەقەرە هاتووە

لە موسنەدی ئیمامی ئەحمەدو سەحیحی موسلیم و تیرمزی و نەسائیدا هاتووە لە ئەبو هورەیرەوە ڕەزای خوای لێبێت کە پێغەمبەری خودا(ﷺ)ئەفەرموێت: ماڵەکانتان مەکەنە گۆڕستان،بێگومان ئەو ماڵەی سورەتی بەقەرەی تێدا دەخوێنرێ شەیتان ناچێتە ناوی[4]. تیرمیزی ئەڵێت: فەرمودەیەکی حەسەنی سەحیحە. وە لە عەبدڵڵای کوڕی مەسعودەوە ڕەزای خوای لێبێت ئەڵێت: بێگومان شەیتان ڕا دەکا لەو ماڵەی سورەتی بەقەرەی تیا دەبیستێ، نەسائی ڕیوایەتی کردووە لە الیوم واللیلە دا[5]. حاکم ڕیوایەتی کردووە لە مستدرەکەکەیدا ئەڵێت: سەنەدەکانی سەحیحە[6]. دارەمی ڕیوایەتی کردووەلە

---

[1] فتح الباری /١١/٢٠٣ /، مسلم/١/٣٠٧ ص٢٨.

[2] مسلم /١/٣٠٧.

[3] مسلم /١/٣٠٣.

[4] أحمد /٢/٢٨٤/، تحفة الاحوذی /٨/١٨٠ /،النسائی فی الکبرا /٥/١٣/ سەحیحە.

[5] النسائی فی الکبرا /٦/٢٤٠.

[6] الحاکم /٢/٢٦٠.

موسنەدەکەیدا لە ئیبنو مەسعودەوە ئەڵێت: هیچ ماڵێ نیە کە سورەتی بەقەرەی تیا بخوێنرێ مەگین شەیتان لێی دەردەچێ و تڕ لێئەدا. دیسان ڕیوایەتی کردوە لە ڕێگەی شەعبیەوە،وتی: عەبدڵڵای کوڕی مەسعودئەڵێت: هەرکەسێ دەئایەت لە سورەتی بەقەرەی خوێندبێ لە شەوێکا،شەیتان ناچێتە ئەو ماڵە ئەو شەوە. چوار ئایەت لەسەرەتایەوەو ئایەتەلکورسی دوو ئایەتیش لە دوایدوەو سێ ئایەتیش لە کۆتایی سورەتەکەوە. وە لە ڕیوایەتێکی ترا هاتووە: ئەو ڕۆژە شەیتان نزیکی خۆیی و ماڵ و منداڵی نابێتەوە،هیچ شتێك دلگرانی ناکا وە ناخوێنرێ بەسەر شتێکا مەگین بەئاگا دێتەوە[1]. وە لە سەهلی کوڕی سەعدەوە ئەڵێت: پێغەمبەری خودا(ﷺ) ئەفەرموێت: بێگومان هەموو شتێك لوتکەیەکی هەیە، بێکومان لوتکەی قورئان بەقەرەیە،بێگومان هەرکەسێ شەوێك لە ماڵی خۆیدا بیخوێنێ سێ شەو شەیتان ناچێتە ناوی، وە هەرکەس بەڕۆژ لە ماڵی خۆیدا بیخوێنێ سێ ڕۆژ شەیتان ناچێتە ناوی[2]. ئەبولقاسمی تەبەرانی و ئەبو حاتەم و ئیبنو حەبان لە سەحیحەکەیداو ئیبنو مەردەوەیهیش ڕیوایەتیان کردووە، تیرمیزی و نەسائی و ئیبنو ماجە ڕیوایەتیان کردووە لە ئەبو هورەیرەوە ڕەزای خوای لێبێت ئەڵێت: پێغەمبەری خودا(ﷺ) شاندێکی نارد کە ژمارەیەك بوون قورئانی پێخوێندن، هەرکەسێ چەندی قورئان لەبەر بوو خوێندی،هاتە لای پیاوێکیان کە لە هەموویان لە تەمەنا لاوتر بوو فەرمووی: ئەی فلان ئەی تۆ چەندت لەبەرە؟وتی: ئەوندەو ئەوەندەم لەبەرەو سورەتی بەقەرەیش. فەرموی ئایە سورەتی بەقەرت لەبەرە؟ وتی: بەڵێ،فەرموی: بڕۆ تۆ ئەمیریان بە یەکێ لە پیاو مەعقولەکانیان وتی: سوێند بەخوا هیچ شتێك نەبوە ڕێگرم کە فێری سورەتی بەقەرە ببم جگە لەوە نەبێ من لەوە ترسام نەتوانم پێی هەڵسم،پێغەمبەری خودا(ﷺ) فەرمووی: فێری قورئان بن و بیخوێنن، بێگومان وێنەی قورئان بۆ ئەو کەسەی فێری دەبێ و دەیخوێنێ وەك وێنەی هەمانەیە کیسێ پڕ لە میسك وایە بۆنەکەی بە هەموو شوێنێکا بڵاو دەبێتەوە. وە وێنەی ئەو کەسەی فێری دەبێ و کردەکەوێ و ئەوە لەناو سکیایە وەك وێنەی هەمانە وایە لەمیسك دەمی بەسترابێ. ئەمە وتەی تیرمزیەو ڕیوایەتی کردوەوئەڵێت: فەرمودەیەکی حەسەنە،پاشان بە مورسەلیش ڕیوایەتی کردووە و الله أعلم[3]. بوخاری ڕیوایەتی کردوە لە ئوسەیدی کوڕی موزایدەوە ڕەزای خوای لێبێت وتی کاتێ ترو لە شەودا سورەتی بەقەرەی دەخوێند ئەسپەکەی لەلایەوە بەسترابۆوە. ئەسپەکەی کەوتە سمکۆڵان، ئەو بێدەنگ دەبوو، ئەویش بێدەنگ دەبوو،ئەو دەیخوێند،ئەویش دەستی دەکردەوە بە سمکۆڵان،ئەو بێدەنگ دەبوو،ئەویش دەستی پێدەکردەوە دیسان دەستی کردەوە بە خوێندن ئەسپەکەیش دەستی کردەوە

---

[1] الدار حی /٢/٣٢٢ ص٢٨.

[2] الطبری /٦/١٦٣/، ابن حبان/٢/٧٨/، مەسنەکەی حەسەنەو سەنەدەکانی لاوازە.

[3] تحفة الاحوذی /٨/١٨٦/، النسائی فی الکبرا/٥/٢٢٧/، ابن ماجة/١/٧٨/ لە حەسەن دەچێت.

بە سمكۆڵان و پاشان هەڵسا یەحیای كوڕی لێیەوە نزیك بوو ترسا لەوەی بچێ بەسەریدا دوری خستەوە و لایدا،سەری بەرز كردەوە بۆ ئاسمان هەتا لەبەر چاوی وون بوو،كاتێ كە ڕۆژی لێبوەوە ئەوی بۆ پێغەمبەر(ﷺ) باسكرد. فەرموی: ئەی كوڕی حضیر بخوێنە!وتی: ئەی پێغەمبەری خودا(ﷺ)! یەحیای لێوە نزیك بوو ترسام پێی پیا بنێ سەرم هەڵبڕی و وەرگەڕامەوە سەر یەحیاكە سەرم بۆ ئاسمان هەڵبڕی هەروەك پەڵە هەور وابوو چرای زۆری تیا بوو، ڕۆشت تا لەبەرچاوم ون بوو. پێغەمبەر(ﷺ) فەرمووی: ئەزانی ئەوە چی بوو؟ ئوسەید وتی: نەخەیەر. پێغەمبەر(ﷺ) فەرمووی: ئەوە فریشتە بوون لەبەر دەنگی تۆ لێت نزیك بوونەوە وەئەگەر بەردەوام بویتایە لە خوێندن كە ڕۆژت دەكردەوەخەڵكی سەیریان دەكردو لێیان نە ئەشارایەوە[1]. هەربەم جۆرە پێشەواو زانا ئەبو عوبەید قاسمی كوڕی سەلام لە كتێبی فضائیل القرءان دا ڕیوایەتی كردوە، والله أعلم. ئیمامی ئەحمەد ئەڵێت: ئەبو نوعەین بۆی گێڕاینەوە،بەشیری موری موهاجیر بۆی گێڕاینەوە، عەبدوڵلای كوڕی بورەیدەبۆی گێڕامەوە لە باوكیەوەئەڵێت: لە خزمەت پێغەمبەردا(ﷺ) دانیشتبووم گوێم لێی بوو ئەیفەرموو: فێری سورەتی بەقەرە ببن،چونكە خوێندنی پیت وبەرەكەتە، وازلێهێنانی مایەی پەشیمانی و خەفەتە، كەسانی بێورەو كەمتەرخەم پێی ناوێرن. وتی: پاشان ماوەیەك بێدەنگ بوو پاشان فەرمووی: فێری سورەتی بەقەرەو ئالی عیمران ببن،چونكە ئەمانە دوو گوڵ ڕەنگن سێبەر دەكەن بۆ خاوەنەكانیان لە ڕۆژی قیامەتا وەك دوو پەڵە هەور یان وەك دوو سێبەر یان وەك دوو پۆل لە باڵندە كە باڵیان ڕەپ كردووە. بێگومان ئەم قورئانە دەگات بە خاوەنەكەی لە ڕۆژی قیامەتا كاتێ گۆڕەكەی بۆ لەت دەكرێ، وەك پیاوێكی لاوازی ڕەنگ زەردپێی دەڵێ: ئایا من دەناسی؟دەڵێ: من تۆ ناناسم،پێی دەڵێ: من هاوەڵەكەی تۆم ئەو قورئانەی كە تۆم تینو كرد لە قرچەی گەرماداو شەوەكەتم بە بێداری هێشتەوە وە بێگومان هەموو بازرگانێ بە دوای بازرگانیەكەیەوەیە، وە تۆ ئەمڕۆ بە دوای هەموو بازرگانیەكەوەی،موڵكی پێئەدرێت بە لای ڕاستی،هەر مانەوەیش بەلای چەپی،تاجی یوقار لەسەر سەری دادەنرێت، دوو پۆشاك دەكرێتە بەری باوك و دایكی خەڵكی دونیا ناتوانن بیان كەن (ل يقوم بهما أهل الدنيا) دەڵێن: لەبەر چی ئەمەمان لەبەر كراوە؟پێیان دەوترێ،بە خوێندنی قورئانی منداڵەكەتان،پاشان دەوترێ: بخوێنەو سەركەوە بە پلەو ژورەكانی بەهەشتا،ئەویش هەر لەبەرز بوونەوەدایە تا بەردەوام بێت لە قورئان خوێندن،هەروادەبێ تا بیخوێنێ یان بەنەرمی و نیانی و ڕوانی بیخوێنێ[2]. ئیبنو ماجەش هەندێك لە فەرمودەكەی بەشیری كوڕی موهاجیرەوە ڕیوایەت كردووە[3].

---

[1] فتح الباري /٦٨٠/٨/ ص٢٩.

[2] أحمد /٣٥٢/٥/ ص٢٩ /حاكم بە سەحیحی داناوە.

[3] ابن ماجة/١٢٤٢/٢/حاكم بە سەحیحی داناوە.

سەنەدەکەی حەسەنە لەسەر مەرجی موسلیم وە بۆ هەندێ لەم فەرمودەیە چەند بەلگە هەیە. لەوانە فەرمودەی ئەبوو ئومامەی باهلیی، ئیمامی ئەحمەد ڕیوایەتی کردووە لێی ئەڵێت: بیستم لە پێغەمبەری خودا(ﷺ) ئەیفەرموو: قورئان بخوێنن،چونکە لە ڕۆژی قیامەتا دێت و تکا دەکا بۆ خاوەنەکانی هەردوو گوڵ ڕەنگەکە بخوێنن: (البقره) و سورەتی (آل عمران) چونکە ئەم دوانە لە ڕۆژی قیامەتا وەك دوو پەڵە هەور یان وەك دوو سێبەر، یان وەك دوو پۆل لە باڵندە کە باڵیان ڕەپکردوە لە ئاسماندا دێن بەرگری لە خاوەنەکانیان دەکەن. سورەتی بەقەرە بخوێنن چونکە خوێندنی پیت و بەرەکەتەو واز لێهێنانی مایەی پەشیمانی و خەفەتە. کەسانی بێورەو کەمترخەم پێی ناوێرن[1]. موسلیمیش ڕیوایەتی کردووە لە نوێژا[2]. الزهراوان دوو ڕوناك کەرەوەکە. (الغاية) ئەوەی سێبەری بۆ کردووی لەسەرتەوە (الفراق) پاچەیە لەشتێك (الصواف) ڕێك و بەیەکەوە. (البطلة)جادووگەران واتە: جادووگەران ناتوانن لەبەری بکەن و بیپارێزن. وتراویشە: ناتوانن کار بکەنە سەر ئەو کەسەی قورئا دەخوێنێ و الله أعلم. وە هەرلەو جۆرە فەرموودەکەی نەواس کوڕی سەمعان کە ئیمامی ئەحمەد ڕیوایەتی کردوە ئەڵێت: بیستم لە پێغەمبەری خودا(ﷺ) ئەیفەرموو: قورئان وئەو کەسانەی کە کاریان پێکردووە،سورەتی بەقەرەو ئالی عمران پێشیان کەوتووە،پێغەمبەری خودا(ﷺ) سێ نموونەی بۆ هێناونەتەوە، دوای ئەوە من لە بیرم نەچوەتەوە فەرمووی: وەك دوو پەڵە هەور یان وەك دوو سێبەری ڕەش ڕوناکیەك لە نێوانیاندا بێت یا وەك دوو پۆل باڵندە کە باڵیان ڕەپ کردووە لە ئاسماندا بەرگری لە خاوەنەکانیان دەکەن[3]. موسلیم ڕیوایەتی کردووە. ترمیزیش هەر ڕیوایەتی کردووە وئەڵێت: فەرمودەیەکی حەسەنی غەریبە[4].

### سوورەتی بەقەرە لە مەدینە هاتۆتە خوارەوە,بێ جیاوازی و ناکۆکی

سوورەتی بەقەرە هەمووڵەمەدینە هاتۆتە خوارەوە بە کۆدەنگی زانایان،وە لەو سوورەتانەیە کە لە سەرەتاوە لە مەدینە هاتۆتە خوارەوە. بەڵام ئەم ئایەتە کە خودای گەورە ئەفەرموێت: ﴿وَٱتَّقُواْ يَوْمًا تُرْجَعُونَ فِيهِ إِلَى ٱللَّهِ ثُمَّ تُوَفَّىٰ كُلُّ نَفْسٍ مَّا كَسَبَتْ وَهُمْ لَا يُظْلَمُونَ﴾[5] ترسیشتان لەو ڕۆژە هەبێ کە دەهێنرێنەوە لای خودا. وتراوە ئەمە دواین ئایەتە کە هاتۆتە خوارەوە لە قورئاندا. وە هەڵیش دەگرێ کە دواین ئایەت بێت لە سوورەتی بەقەرەدا هاتبێتە خوارەوە. وە ئایەتی ڕیباش لە دواینی ئایەتەکانە کە هاتۆتە خوارەوە. خالیدی کوڕی مەعدان سوورەتی بەقەرەی ناو ناوە بە چادرو دەواری قورئان.

---

[1] أحمد /٥/٢٤٩/، حاکم بە سەحیحی دلناوە.

[2] مسلم /١/٥٥٣.

[3] مسلم /١/٥٥٤.

[4] تحفة الاحوذی /٨/١٩١.

[5] البقرة ٢٨١.

هەندێ لە زانایان وتویانە: سوورەتی بەقەرە پێکهاتووە لە هەزار هەواڵ و لە هەزار فەرمان و هەزارقەدەغە. ئەوانەی هەژماریان کردووە دەڵێن: ئایەتەکانی دووسەدو هەشتاو حەوت ئایەتە. وتەکانی شەش هەزارو دووسەدو بیست و یەك وتەیە. پیتەکانیشی بیست و پێنج هەزارو پێنج سەد پیتە والله أعلم. ئیبنو جورەیج لە عەتاوە لە ئیبنو عەباسەوە ئەڵێت: سوورەتی بەقەرە لە مەدینە هاتۆتە خوارەوە[1]. فوسەیف وتی: لە مەجاهیدەوە لە عەبداللەی کوڕی زوبەیرەوە ئەڵێت: سوورەتی بەقەرە لە مەدینە هاتۆتە خوارەوە[2]. زۆرێ لە پێشەواو زانایان و خاوەن تەفسیرەکان هەروایان وتوەو جیاوازی و ناکۆکی نیە لە سەری. ئیبنو مەردوەیهی ڕیوایەتی کردووە لە فەرمودەکەی شوعبەی کوڕی عەقیلی کوڕی تەلحەوە لە عوتبەی کوڕی فەرحەدەوەئەڵێت: پێغەمبەری خودا(ﷺ) دواکەوتنێکی بینی لە هاوەڵەکانیدا فەرمووی: ئەی هاوەڵانی سوورەتی بەقەرە وا دەزانم ئەوە لە ڕۆژی حونەیندا بوو،ئەو ڕۆژەی کە بەرەو دوا هەڵاتن فەرمانی دا بە عەباس بانگی کردن،وتی: ئەی هاوەڵانی درەختەکە یانی: ئەی هاوەڵانی بەیعەتی ڕزوان وە لە ڕیوایەتێکی تردا: ئەی هاوەڵانی سوورەتی بەقەرە! بۆ ئەوەی چالاك و دڵخۆش و بزێویان بکاتەوە. وایان لێهات لە هەموو لایەکەوە بەرەو پێغەمبەر(ﷺ) دەهاتن،وە لە ڕۆژی یەمامەشدا لەگەڵ دارو دەستەی موسەیلەمەدا، هاوەڵەکانی پێغەمبەر(ﷺ) وایان لێهات هەڵدەهاتن لەبەر زۆری سوپای بەنی حەنیفە، لەو کاتەدا هاوەڵانی کۆچەرو ئەنساریەکان بانگی یەکتریان دەکرد و دەیان ووت: ئەی هاوەڵانی سوورەتی بەقەرە، تا خودای گەورە سەری خستن ڕەزای خودا لەسەر هەموو هاوەڵانی پێغەمبەر بێت (ﷺ)[3].

بِسْمِ اللَّهِ الرَّحْمَٰنِ الرَّحِيمِ

﴿الٓمٓ ① ذَٰلِكَ ٱلْكِتَٰبُ لَا رَيْبَ ۛ فِيهِ ۛ هُدًى لِّلْمُتَّقِينَ ② ٱلَّذِينَ يُؤْمِنُونَ بِٱلْغَيْبِ وَيُقِيمُونَ ٱلصَّلَوٰةَ وَمِمَّا رَزَقْنَٰهُمْ يُنفِقُونَ ③ وَٱلَّذِينَ يُؤْمِنُونَ بِمَآ أُنزِلَ إِلَيْكَ وَمَآ أُنزِلَ مِن قَبْلِكَ وَبِٱلْءَاخِرَةِ هُمْ يُوقِنُونَ ④ أُو۟لَٰٓئِكَ عَلَىٰ هُدًى مِّن رَّبِّهِمْ ۖ وَأُو۟لَٰٓئِكَ هُمُ ٱلْمُفْلِحُونَ ⑤﴾

### ﴿الٓمٓ﴾ قسە کردن دەربارەی پیتە بڕاوەکان (المقطعة)

پیتە بڕاوەکان کەلەسەرەتای سوورەتەکانەوەیە، ئەوپیتانەن کەزانینی لەلای خودا خۆیەتی، ئەمە ڕیوایەت کراوە لە ئەبو بەکرو عومەرو عوسمان و عەلی و ئیبنو مەسعودەوە ڕەزای خودا لە هەموویان. وتراوە: ئەمە ناوی سوورەتەکانە. وە وتراوە: ئەمانە سەرەتان، خودا سەرەتای قورئانی پێدەکاتەوە. وە خوسەیف وتی لە موجاهیدەوە کە وتویەتی: سەرەتای گشت سورەتەکان (ق و ص و طم و طسم و

---

[1] الدار المنثور /٤٧١ ص٣٠.

[2] الدار المنثور /٤٧/١.

[3] المجمع /١٨٠/٦ ص٣٠.

الرا) جگە لەمە حونجە کردنی دانراوە (هجاءٍ موضوع) هەندێ لە عەرەبەکان وتویانە: ئەوانە چەند پیتێکن لە پیتەکانی فەرهەنگ، بە باسکردنی هەندێکیان لە سەرەتای سوورەتەکانەوە پێویست بە باسکردنی ئەوانی تر ناکا کە لە تەواو کەری بیست و هەشت پیتەکەی ترن، وەك کەسێ دەڵێ: کوڕەکەم دەنوسێ (ا ب ت ث) باسکردنی هەندێکی بەسە بۆ باسکردنی هەمووی، ئیبنو جەریر ئەمەی گێڕاوەتەوە[1]. منیش دەڵێم: کۆی ئەو پیتانەی کە باس دەکرێن لەسەرەتای سوورەتەکانەوە بە لابردنی پیتە دووبارە کراوەکانەوە لێیان چواردە پیتن، کە بریتین لە (أ ل م ص ر ك ه ي ع ط س ح ق ن) ئەم دەقە کۆیان دەکاتەوە (نص حليم قاطع له سر) کە نیوەی پیتەکانە بە ژمارە، ئەوانەی باسکراوە لێیان بەڕێزترە لەوانی تر. زەمەخشەری ئەڵێت: ئەم چواردە پیتە پێك هاتووە لە جۆرو چەشنی پیتەکان. یانی: پیتە بێدەنگ و دەنگ دارو نەرم و توند و داخراوو کراوەو بەرز و نزم و لە پیتە جولاوەکان بە درێژی هێناونیی و پاشان وتی: پاك و بێعەیبی بۆ ئەو خودا کە گشت کارەکانی پڕە لە وردەکاری و کارزانی. ئەم جۆرە پیتانە زۆرن بەوانەیشەوە کە باسکران. وە دیارە گرنگی شتێ و بەرێزی، جیگەی ئەوانی تریش هەموو دەگرێتەوە، هەر بۆیە هەنێ لە زانایان لێرەدا قسەیە چاکیان کردووە و وتویانە: گومانی تێدا نیە کە خودای گەورەئەم پیتانەی بێهودەو بێسود نەناردۆتە خوارەوە. ئەوەی کە نەفامەکان دەڵێن: لە قورئاندا هاتووە(ما هو تعبد) هیچ مانایەکی نیە. ئەوانە هەڵەیەکی زۆر گەورەیان کردووە. وای دابنێ خۆی لە خۆیدا مانای هەیە، خۆ ئەگەر لە پێغەمبەرەوە(ﷺ) شتێکمان بۆ باسکرا،ئێمەش باسی دەکەین ئەگەر نەبوو، لە کوێدا وەستاوین دەوەستین و دەڵێین: ﴿ هُوَ ٱلَّذِيٓ أَنزَلَ عَلَيۡكَ ٱلۡكِتَٰبَ مِنۡهُ ءَايَٰتٞ مُّحۡكَمَٰتٌ هُنَّ أُمُّ ٱلۡكِتَٰبِ وَأُخَرُ مُتَشَٰبِهَٰتٞۖ فَأَمَّا ٱلَّذِينَ فِي قُلُوبِهِمۡ زَيۡغٞ فَيَتَّبِعُونَ مَا تَشَٰبَهَ مِنۡهُ ٱبۡتِغَآءَ ٱلۡفِتۡنَةِ وَٱبۡتِغَآءَ تَأۡوِيلِهِۦۗ وَمَا يَعۡلَمُ تَأۡوِيلَهُۥٓ إِلَّا ٱللَّهُۗ وَٱلرَّٰسِخُونَ فِي ٱلۡعِلۡمِ يَقُولُونَ ءَامَنَّا بِهِۦ كُلّٞ مِّنۡ عِندِ رَبِّنَاۗ وَمَا يَذَّكَّرُ إِلَّآ أُوْلُواْ ٱلۡأَلۡبَٰبِ ﴾[2] بڕوامان پێی هەیەو ئەمانە گشت لە پەروەردگارمانەوەیە. زانایان کۆدەنگ نین لە سەر شتێکی دیاری کراو،هەرکەسێ بە بەڵگە هەندێ شتی بۆ دەرکەوت ئەو شوێن کەوتنی پێویستە، ئەگەر بەڵگە نەبوو دەبێ بوەستین تا ڕوون و ئاشکرا دەبێ،ئەمە شێوەیەکیەتی.

### پیتە پچڕاوەکان بەڵگەن لەسەر دەرخستنی إعجازی قورئان

شێوەیەکی تری کارزانی کە خواستی ئەم پیتانە لەسەرەتای ئەم سوورەتانەوە بێت کامەیە؟ بێ ئەوەی سەیری ماناکانی لە ناو خۆیدا،وتراوە: بۆیە ئەم پیتانە لەسەرەتای ئەم سوورەتانەوە باس کراوە تا دەرئەسەی ئیعجازی قورئانی تیا دربخاو ڕونی بکاتەوە کە خەڵکی دەستەوسان و بێهێزو

[1] الطبری /١/٢٠٨.

[2] ال عمران ٧.

لاوازن، ناتوانن بە وێنەی ئەم قورئانەبێنن،لەگەڵ ئەوەدا کە ئەم قورئانە پێك هاتووە لەو پیتانە کە ئەوان قسەی لەگەڵ یەك پێدەکەن، ڕازی ئەم ڕێبازەی باسکردووە لە تەفسیرەکەیدا لە موبەڕیدو کۆمەڵێ لە لێکۆڵەرەوان قورتوبیش گێڕاویەتیەوە لە فراء و قترب هەر بەوجۆرە. زەمەخشەری کە لە شاخەکەیدا بڕیاری لەسەر داوە زۆر باش پشتگیری لێکردووە. مامۆستاو پێشەواو زۆر زانا ئەبولعەباس کوڕی تەمیمە و مامۆستامان حافیزی موجتەهیدئەبو لحەجاجی مەزی، کە بۆی گێڕاومەتەوە لە ئیبنو تەیمیەوە. زەمەخشەری وتی: هەمووی لەسەرەتای قورئانەوە بە کۆمەڵی نەهاتووە،بۆ ئەوەی دووبارە کردنەوەکە بەهێزتر بێت بۆ بەرەنگاربوونەوە و بەگژاچوون وەك چۆن بەسەرهاتەکان دووبارە بوەتەوەو بە گژاچونەکەیش بە ئاشکرا دووبارە بوەتەوە لە چەند شوێنا وتی: ئەم پیتانە بە یەك پیتی هاتوون. وەك خودای گەورە ئەفەرموێت: ﴿الٓمٓ ۝١ ذَٰلِكَ ٱلۡكِتَٰبُ لَا رَيۡبَۛ فِيهِۛ هُدٗى لِّلۡمُتَّقِينَ﴾ [1] الف لام مم، ئەم کتێبە هیچ گومانی تێدا نیە. ﴿الٓمٓ ۝١ ٱللَّهُ لَآ إِلَٰهَ إِلَّا هُوَ ٱلۡحَيُّ ٱلۡقَيُّومُ ۝٢ نَزَّلَ عَلَيۡكَ ٱلۡكِتَٰبَ بِٱلۡحَقِّ مُصَدِّقٗا لِّمَا بَيۡنَ يَدَيۡهِ وَأَنزَلَ ٱلتَّوۡرَىٰةَ وَٱلۡإِنجِيلَ﴾ [2] الف لام مم، جگە لە خودا هیچ شت بۆ پەرستن ناشێ،هەر زیندووەو بەسەر هەموو شت ڕا دەگا، ئەم کتێبەی کەبە ڕاست بۆ تۆمان ناردووە، باوەڕ بەو کتێبانەش دەکا کە پێش لەم لە خوداوە ڕەوانە کراون. ﴿الٓمٓصٓ ۝١ كِتَٰبٌ أُنزِلَ إِلَيۡكَ فَلَا يَكُن فِي صَدۡرِكَ حَرَجٞ مِّنۡهُ لِتُنذِرَ بِهِۦ وَذِكۡرَىٰ لِلۡمُؤۡمِنِينَ﴾ [3] الف لام مم صاد، کتێبێکە بۆ تۆ هاتۆتە خوارەوە خۆت توشی دڵتەنگی مەکە لەو بارەوە. ﴿الٓرۚ كِتَٰبٌ أَنزَلۡنَٰهُ إِلَيۡكَ لِتُخۡرِجَ ٱلنَّاسَ مِنَ ٱلظُّلُمَٰتِ إِلَى ٱلنُّورِ بِإِذۡنِ رَبِّهِمۡ إِلَىٰ صِرَٰطِ ٱلۡعَزِيزِ ٱلۡحَمِيدِ﴾ [4] الف لام ڕاء، کتێبێکە بۆ تۆمان ناردە خوارەوە، تا خەڵکی بەئیزنی پەروەردگاریان لە تاریکی بەرەو ڕووناکی دەربهێنێ. ﴿الٓمٓ ۝١ تَنزِيلُ ٱلۡكِتَٰبِ لَا رَيۡبَ فِيهِ مِن رَّبِّ ٱلۡعَٰلَمِينَ﴾ [5] الف لام مم، ئەم کتێبە لە ڕاهێنەری دونیاوە ڕەوانە کراوە و گومانی تێدا نیە. ﴿حمٓ ۝١ تَنزِيلٞ مِّنَ ٱلرَّحۡمَٰنِ ٱلرَّحِيمِ﴾ [6] حامیم هاتۆتە خوار لەو کەسەوە کە دەهەندەی دلۆڤانە. ﴿حمٓ ۝١ عٓسٓقٓ ۝٢ كَذَٰلِكَ

---

[1] البقرة ١-٢.

[2] ال عمران ١-٣.

[3] الاعراف ١-٢.

[4] إبراهيم ١.

[5] السجدة ١-٢.

[6] فصلت ١-٢.

یُوحِیٓ إِلَیۡكَ وَإِلَی ٱلَّذِینَ مِن قَبۡلِكَ ٱللَّهُ ٱلۡعَزِیزُ ٱلۡحَكِیمُ ﴾[1] حا میم عین سین قاف، خودای خاوەن دەسەلاتی کارزان، فەرمانی خۆی ئاوا بۆ تۆ و پێغەمبەرانی پێش لە تۆش ڕێ دەکا. وە چەندین ئایەتی تریش کە بەلگەن لەسەر ڕاستی ئەو ڕێبازەی ئەوانە لەسەری ڕۆشتوون بۆ کەسێ بە چاکی سەیر بکات. و الله أعلم.

### هیچ گومانێك لە قورئاندا نیە

خودای گەورە ئەفەرموێت: ﴿ذَٰلِكَ ٱلۡكِتَٰبُ لَا رَیۡبَۛ فِیهِۛ هُدًی لِّلۡمُتَّقِینَ﴾ ئەم کتێبە هیچ گومانی تێدا نیە بۆئەوانەی پارێزگارن ڕێ نیشاندەرە. ﴿ٱلۡكِتَٰبُ﴾ یانی: قورئان، ﴿لَا رَیۡبَۛ فِیهِ﴾ یانی: گومان. سوودی لە ئەبو مالیکەوە و لە ئەبو سالحەوە لە ئیبنو عەباسەوە،وە لە مورەی هەمدانیەوە لە ئیبنو مەسعودەوە،وە لە کەسانێکەوە لە هاوەڵەکانی پێغەمبەری خوداوە(ﷺ) ئەڵێت: ﴿لَا رَیۡبَۛ فِیهِ﴾ هیچ گومانی تیا نیە[2]. ئەبو دەردائو ئیبنو عەباس و موجاهید و سەعیدی کوڕی جوبەیرو ئەبو ماکیك و نافیعی مەولای کوڕی عومەرەوە و عەتا و ئەبو عالیە و ڕەبیعی کوڕی ئەنەس و موقاتیلی کوڕی حەیان وسوودی و قەتادە و ئیسماعیلی کوڕی ئەبو خالیدەوە کە هەر وایان وتوە. ئیبنو ئەبی حاتەم ئەڵێت: من وا نازانم هیچ ناکۆکیەك هەبێ لە نێوان زانایاندا لەسەری[3]. مانای قسەکە ئەوەیە لێرەدا کە ئەم کتێبە کە قورئانە هیچ گومانی تێدا نیە لەلایەن خوداوە ڕەوانە کراوە. وەك خودای گەورە لە سوورەتی سەجدەدا فەرمویەتی: ﴿الٓمٓ ۝١ تَنزِیلُ ٱلۡكِتَٰبِ لَا رَیۡبَ فِیهِ مِن رَّبِّ ٱلۡعَٰلَمِینَ﴾[4] الف لام مم، هێنانە خوارەوەی ئەم قورئانە هیچ گومانی تێدا نیە لەلایەن پەروەردگاری جیهانەوەیە. هەندێ لە زانایان وتویانە. ئەمە خەبەرەو مانای نەهی تێدایە، واتە هیچ گومانتان تێیدا نەبێ. وە لە خوێندنەوەی ئەوانی کە لەسەر(لَا رَیۡبَۛ)وەستاون و پاشان دەستیان پێکردوەتەوە بە ﴿فِیهِ هُدًی لِّلۡمُتَّقِینَ﴾ ڕێ نیشاندەری تێدایە بۆ پارێزگاران. بەلام وەستان باشترە لەسەر ﴿لَا رَیۡبَۛ فِیهِۛ﴾ لەو ئایەتەی کە باسمان کرد، چونکە (هُدًی) دەبێتە سیفەت بۆ قورئان، ئەمەیش ڕەوانترە لە باتی ﴿فِیهِ هُدًی﴾ هجی هەڵدەگرێ لە زمانی عەرەبیدا مەرفوع بێ لەسەر نەعت و مەنسوبیش بێ لەسەر حال.

---

[1] الشوراء ١-٣.

[2] الطبری /١/٢٢٨ ص٣١.

[3] ابن ابی حاتم /١/٣١.

[4] السجدة ١-٢.

## تایەبەت مەندی شارەزایی بە خۆ پارێزیەوە

شارەزایی تایەبەت کراوە بە خوا ناسانەوە. وەك خودای گەورە ئەفەرموێت: ﴿وَلَوْ جَعَلْنَٰهُ قُرْءَانًا أَعْجَمِيًّا لَّقَالُوا۟ لَوْلَا فُصِّلَتْ ءَايَٰتُهُۥٓ ءَا۬عْجَمِىٌّ وَعَرَبِىٌّ قُلْ هُوَ لِلَّذِينَ ءَامَنُوا۟ هُدًى وَشِفَآءٌ وَٱلَّذِينَ لَا يُؤْمِنُونَ فِىٓ ءَاذَانِهِمْ وَقْرٌ وَهُوَ عَلَيْهِمْ عَمًى أُو۟لَٰٓئِكَ يُنَادَوْنَ مِن مَّكَانٍۭ بَعِيدٍ﴾[1] بلێ: ئەمە بۆ کەسانێ کە باوەڕیان پێهێناوە، ڕێبەرو چارەی دەردانە ئەوانەش بڕوای پێناکەن، گوێ گرانن لە بیستن و چاویان لە دیتنی کوێرە هەردەلێی لە جێی دوورەوە بانگ دەکرێن. وە ئەفەرموێت: ﴿وَنُنَزِّلُ مِنَ ٱلْقُرْءَانِ مَا هُوَ شِفَآءٌ وَرَحْمَةٌ لِّلْمُؤْمِنِينَ وَلَا يَزِيدُ ٱلظَّٰلِمِينَ إِلَّا خَسَارًا﴾[2] ئێمە لەگەڵ ئەم قورئانە شتی وات بۆ بەڕێ دەکەین کە شیفاو بەزەیی تێدایە بۆ خاوەنباوەڕان و ناهەقانیش پێی زیانبار دەبن. چەندین ئایەتی تریش کە بەڵگەن لەسەر تایەبەتمەندی خاوەن باوەڕانەوە کە سودمەند دەبن بە قورئان،چونکە قورئان خۆی لە خۆیدا ڕێنیشاندەرە،بەلاَم چاکە خوازان نەبێ ئەوە وەرناگرێ وەك خودای گەورە ئەفەرموێت: ﴿يَٰٓأَيُّهَا ٱلنَّاسُ قَدْ جَآءَتْكُم مَّوْعِظَةٌ مِّن رَّبِّكُمْ وَشِفَآءٌ لِّمَا فِى ٱلصُّدُورِ وَهُدًى وَرَحْمَةٌ لِّلْمُؤْمِنِينَ﴾[3] ئەی خەڵکینە ! لە لایەن پەروەردگارتانەوە ئامۆژگاریەکتان بۆ هاتووە چارەی دەردی دڵانیشەو ڕێ نیشاندەرو بەزەییە بۆ باوەڕداران. وە لە ئیبنو عەباس و ئیبنو مەسعودو هەندێ لە هاوەڵانی پێغەمبەری خوداوە(ﷺ) هاتووە، ﴿هُدًى لِّلْمُتَّقِينَ﴾ یانی: ڕووناکیە بۆ لە خوا ترسان.

## مانای خۆ پارێزان ﴿المتقين﴾

ئیبنو عەباس ئەڵێت: ﴿هُدًى لِّلْمُتَّقِينَ﴾ ئەو خاوەن باوەڕانەن کە خۆیان دەپارێزن لە شەریك دانان بۆم و بە پێی بەرفەرمانی من کاردەکەن. وە هەر لە ئیبنو عەباسەوە ئەڵێت: (لِّلْمُتَّقِينَ) ئەوانەن کە لەتۆڵەی خودا دەترسن لە واز هێنان لەو شتانەی کە دەیزانن لە شارەزایی. وە بە هیوای بەزەیی خودان لە بڕوا هێنانیان بەوەی کە پێی هاتووە بۆیان. قەتادە ئەڵێت: (لِّلْمُتَّقِينَ) ئەو کەسانەن کە خودا وەسفی کردوون بەم ئایەتە کە ئەفەرموێت: ﴿ٱلَّذِينَ يُؤْمِنُونَ بِٱلْغَيْبِ وَيُقِيمُونَ ٱلصَّلَوٰةَ﴾ ئەو کەسانەی بڕوایان بە نەدیار هەیەو نوێژ دەکەن. لەو ئایەتانەش کە بە دوایدا دێن. ئیبنو جەریر وتی: ئەوانە هەمووی دەگرێتەوە وەك خودا فەرمویەتی، تیرمزی و ئیبنو ماجە ڕیوایەتیان کردووە لە عەتیەی سەعدیەوە وتی: پێغەمبەری خودا

---

[1] فصلت ٤٤.

[2] الاسراء ٨٢.

[3] یونس ٥٧.

(ﷺ) فەرمویەتی: بەندە ناگاتە پلەی خۆپارێزان تا واز دێنێ لەوەی خراپ نیە لە ترسی ئەوەی نەکا خراپەی تێدا بێت[1]. پاشان ترمیزی وتی: فەرمودەیەکی حەسەنی غەریبە.

### شارەزا بوون دوو جۆرە

جاری وا هەیە بە وتەی ڕێنمایی دێت، مەبەست پێی ئەوەیە کە لە دڵدا جێگیر دەبێ لە باوەڕ. ئەمە خودا نەبێ کەس ناتوانێ وەدی بهێنێ لە دڵی بەندەکاندا جگە لە خودای گەورە وەك خودای گەورە ئەفەرموێت: ﴿ إِنَّكَ لَا تَهْدِي مَنْ أَحْبَبْتَ وَلَٰكِنَّ اللَّهَ يَهْدِي مَن يَشَاءُ ۚ وَهُوَ أَعْلَمُ بِالْمُهْتَدِينَ ﴾[2] تۆ ناتوانی کەسێ کە خۆت خۆشت بوێ شارەزای کەی. وە ئەفەرموێت: ﴿لَّيْسَ عَلَيْكَ هُدَاهُمْ وَلَٰكِنَّ اللَّهَ يَهْدِي مَن يَشَاءُ ۗ وَمَا تُنفِقُوا مِنْ خَيْرٍ فَلِأَنفُسِكُمْ ۚ وَمَا تُنفِقُونَ إِلَّا ابْتِغَاءَ وَجْهِ اللَّهِ ۚ وَمَا تُنفِقُوا مِنْ خَيْرٍ يُوَفَّ إِلَيْكُمْ وَأَنتُمْ لَا تُظْلَمُونَ ﴾[3] ئەرکی سەرشانی تۆ نیە ئەمانە بخەیتە سەر ڕێ. وە ئەفەرموێت: ﴿مَن يُضْلِلِ اللَّهُ فَلَا هَادِيَ لَهُ ۚ وَيَذَرُهُمْ فِي طُغْيَانِهِمْ يَعْمَهُونَ ﴾[4] خودا ڕێگە لە هەر کەس بگۆڕێ هیچ ڕێنیشاندەری دەست ناکەوێ. وە ئەفەرموێت: ﴿مَن يَهْدِ اللَّهُ فَهُوَ الْمُهْتَدِ ۖ وَمَن يُضْلِلْ فَلَن تَجِدَ لَهُ وَلِيًّا مُّرْشِدًا﴾[5] هەرکەسێ خودا شارەزای بکا،ئەوا شارەزا دەبێت و هەر کەسێکیش گومڕا بکا دۆستێکی شارەزای بۆ پەیدا ناکرێ. چەندین ئایەتی تریش لەم بارەیەوە هاتووە. جاری واش هەیە مەبەست بە (الهدايە) ڕونکردنەوەی هەق و ئاشکراکردنیەتی بەڕێنمایی و ڕێنیشاندان. وەك خودای گەورە ئەفەرموێت: ﴿وَإِنَّكَ لَتَهْدِي إِلَىٰ صِرَاطٍ مُّسْتَقِيمٍ﴾[6] بێگومان تۆ ڕێنمایی دەکەی بۆ ڕێی ڕاست. وە ئەفەرموێت ﴿إِنَّمَا أَنتَ مُنذِرٌ ۖ وَلِكُلِّ قَوْمٍ هَادٍ﴾[7] تۆ هەر تەنیا ترسێنەرێکی و هیچی تر، وە هەر کۆمەڵێك لە گەلانیش دەبێ ڕێنیشاندەرێك هەبێ. وە ئەفەرموێت: ﴿ وَأَمَّا ثَمُودُ فَهَدَيْنَاهُمْ فَاسْتَحَبُّوا الْعَمَىٰ عَلَى الْهُدَىٰ

---

[1] تحفة الاحوذی /٧/١٤٧/، ابن ماجة /٢/١٤٠٩ لاوازە.

[2] القصص ٥٦.

[3] البقرة ٢٧٢.

[4] الاعراف ١٨٦.

[5] الكهف ١٧.

[6] الشوراء ٥٢.

[7] الرعد ٧.

﴿فَأَخَذَتْهُمْ صَٰعِقَةُ ٱلْعَذَابِ ٱلْهُونِ بِمَا كَانُوا۟ يَكْسِبُونَ﴾[1] ئێمە ڕێگەی بەرەو خۆمان نیشان هۆزی سەمودیشدا، لە باتی شارەزا بونیان، حەزیان کرد هە رنابینا بن. وە ئەفەرموێت: ﴿وَهَدَيْنَٰهُ ٱلنَّجْدَيْنِ﴾[2] وە ڕێگەی چاك و خراپمان نیشان نەداوە. لەسەر تەفسیری ئەوانەی کە وتویانە: مەبەست پێیان چاکەو خراپەیە ئەمەیش پەسەند ترە و الله أعلم.

## مانای خۆ پارێزی (التقوا)

بنەڕەتی خۆپارێزی (التقوا) خۆ پاراستنە لەوەی کە ناخۆشە،چونکە ئەسڵەکەی لە (وقی من الوقایە) وە هاتووە. وە دەڵێن: عومەری کوڕی خەتاب پرسیاری کرد لە ئوبەی کوڕی کەعب دەربارەی (التقوا) ئەویش پێی وت: ئایە تۆ بە ڕێگەیەکی پڕ درك و داڵ دا نەڕۆیشتوی؟ وتی: بەڵێ: وتی: چیت دەکرد؟ وتی: خۆم ئامادە دەکردو هەوڵم ئەدا کە بەرم نەکەوێ وتی: ئائەوە خۆ پارێزیە (التقوی).

## مانای باوەڕ

خودای گەورە ئەفەرموێت: ﴿ٱلَّذِينَ يُؤْمِنُونَ بِٱلْغَيْبِ﴾ ئەو کەسانەی بڕوایان بە نەدیار هەیە. ئەبو جەعفەری ڕازی لە عەلای کوڕی موسەییبی کوڕی نافیعەوە لە ئەبو ئیسحاقەوە لە ئەبو ئەحوەسەوە لە عەبدالله وەئەڵێت: (الایمان) یانی: سەلماندن و بەڕاست زانین[3]. عەلی کوڕی ئەبو تەلحەو کەسانی تریش لە ئیبنو عەباسەوە ڕەزای خوایان لێبێت ئەڵێن: (يُؤْمِنُونَ) یانی: بەڕاستی دەزانن[4]. موعەمەر لە زوهەیرەوە ئەڵێت: (الایمان) یانی: کارکردن[5]. ئەبو جەعفەری ڕازی لە ڕەبیعی کوڕی ئەنەسەوە ئەڵێت: (يُؤْمِنُونَ) یانی: دەترسن[6]. ئیبنو جەریر ئەڵێت: چاکتر ئەوەیە کەوەسف کراون بەوەی کە بڕوایان هەیە بە نادیار بە کردارو بە گفتارو بیرو باوەڕ. جاری وایش هەیە ترسان لە خودا بە مانای باوەڕ دێت کە بریتیە لە سەلماندن بە کردارو گفتار، دیارە باوەڕ وتەیەکی فراوانە بۆ دان پیانان بە بونی خوداو کتێبەکان و پێغەمبەرانی و سەلماندنی ئەو دانپیانانا بەکردار. منیش دەڵێم: (الایمان) لە زماندا تەنیا بۆ بەڕاست زانین بەکار دەهێنرێ. جاری وا هەبووە لە قورئاندا بەکار هێنراوە مەبەست پێی بە ڕاست زانین بووە وەك خودای گەورە ئەفەرموێت: ﴿يُؤْمِنُ بِٱللَّهِ وَيُؤْمِنُ لِلْمُؤْمِنِينَ وَرَحْمَةٌ لِّلَّذِينَ ءَامَنُوا۟

---

[1] فصلت ١٧.

[2] البلد ١٠.

[3] الطبری /١/٢٣٥.

[4] الطبری /١/٢٣٥.

[5] الطبری /٢٣٥.

[6] الطبری /٢٣٥.

مِنكُمْ﴾[1] واتە پێغەمبەر(ﷺ) باوەڕی بە خودا هەیە و باوەڕی بە خاوەن باوەڕانیش هەیە. وە وەك ئەوەی براكانی یوسف بە باوكیان وت: ﴿وَمَآ أَنتَ بِمُؤْمِنٍ لَّنَا وَلَوْ كُنَّا صَـٰدِقِينَ﴾[2] هەرچەندە ڕاستیشت پێدەڵێین،بڕوا بە ئێمە ناكەی. وە هەروەها ئەگەر بەكار هێنرا لەگەڵ كرداردا وەك خودای گەورە ئەفەرموێت: ﴿إِلَّا ٱلَّذِينَ ءَامَنُوا۟ وَعَمِلُوا۟ ٱلصَّـٰلِحَـٰتِ فَلَهُمْ أَجْرٌ غَيْرُ مَمْنُونٍ﴾[3] مەگین ئەوانەی باوەڕدارو ئاكار چاك بوون. بەڵام كاتێ مەبەست پێی بڕوای شەرعی بێت ئەمە دەبێ هەر بە كردارو گوفتارو بیرو باوەڕبێت[4]. ئەم بڕوایە زیاد دەكاو كەمیش دەكا لە فەرموودەو ئاساری زۆردا هاتووە بە تایبەتی لەسەرەتای شەرحی بوخاریدا قسەمان لێكرد. سوپاس و ستایش بۆ خودای مەزن. وە هەندێك بڕوایان بە ترس تەفسیر كردووە وەك خودای گەورە لەم ئایەتەدا ئەفەرموێت: ﴿إِنَّ ٱلَّذِينَ يَخْشَوْنَ رَبَّهُم بِٱلْغَيْبِ لَهُم مَّغْفِرَةٌ وَأَجْرٌ كَبِيرٌ﴾[5] ئەو كەسانەی لە نەدیدە لە پەروەریدگاریان ئەترسن. وە ئەفەرموێت: ﴿مَّنْ خَشِىَ ٱلرَّحْمَـٰنَ بِٱلْغَيْبِ وَجَآءَ بِقَلْبٍ مُّنِيبٍ﴾[6] وەترس لەخودا بوختەی باوەڕو زانیاریە. وەك خودای گەورە ئەفەرموێت: ﴿إِنَّمَا يَخْشَى ٱللَّهَ مِنْ عِبَادِهِ ٱلْعُلَمَـٰٓؤُا۟﴾[7] لەناو عەبدانی خودادا هەر ئەوانەی زۆر زانان لە خودا دەترسن.

**مەبەست بە نادیار (الغیب)**

مەبەست بەنادیار (الغیب) لێرەدا زانایانی پێشینە دەستەواژەی جیاوازیان هەیەو هەموویان ڕاستن و هەمو یەك مەبەستیان هەبووە. ئەبو جەعفەری ڕازی لە ڕەبیعی كوڕی ئەنەسەوە لە ئەبولعالیەوە ئەڵێت: لەم دەقەدا كە خوای گەورە ئەفەرموێت: ﴿يُؤْمِنُونَ بِٱلْغَيْبِ﴾ بڕوایان بە نەدیار هەیە. وتی: باوەڕیان بە خوداو فریشتەكانی و كتێبەكانی و پێغەمبەرەكانی و ڕۆژی دوایی و بەهەشت و ئاگرو چونە خزمەتی هەیە. وە باوەڕیان بە ژیانی دوای مردن و زیندوبونەوە هەیە. ئەمانە هەموو نادیارن،قەتادەش هەروای وتووە[8]. سەعیدی كوڕی مەنسور ڕیوایەتی كردووە لە عەبدالرحمن ی كوڕی یەزیدەوە ئەڵێت:

---

[1] التوبة ٦١.

[2] یوسف ١٧.

[3] التین ٦.

[4] ابن ابی حاتم /٣٥/١.

[5] الملك ١٢.

[6] ق ٣٣.

[7] فاطر ٢٨.

[8] الطبری /٢٣٦/١ ص٣٢.

لە لای عەبداللەی کوڕی مەسعود دانیشتبوین، باسی هاوەڵانی پێغەمبەرمان(ﷺ) دەکرد وە لەو شتانەی کە پێش کەوتون لە ئێمە. عبدالله وتی: فەرمانی پێغەمبەر(ﷺ) زۆر ئاشکرا بوو لە لای ئەوانەی کە چاویان پێی کەوت. سوێند بەو کەسەی کە هیچ شتێ بۆ پەرستن ناشێ جگە لەو،هیچ کەس هەرگیز باوەڕی نەهێناوە ئەو باوەڕە چاکتر بێ لە بڕوا بە نەدیار (الغیب) پاشان ئەم ئایەتانەی خوێند: ﴿الٓمٓ ۝١ ذَٰلِكَ ٱلۡكِتَٰبُ لَا رَيۡبَۛ فِيهِۛ هُدٗى لِّلۡمُتَّقِينَ ۝٢ ٱلَّذِينَ يُؤۡمِنُونَ بِٱلۡغَيۡبِ﴾، لام،میم ئەم کتێبە هیچ گومانی تێدا نیە، بۆ ئەوانەی پارێزگارن ڕێنیشاندەرە. ئەو کەسانەی بڕوایان بە نەدیار هەیە تا ئەکاتە(ٱلۡمُفۡلِحُونَ )[1] ڕزگارن. هەر بەو جۆرە ئیبنو ئەبی حاتەم ئیبنو مەردەوەیهی و حاکیم لە موستەدرەکەکەیدا ڕیوایەتیان کردووە[2]. مانای ئەم فەرمودەیە کە ئیمامی ئەحمەد ڕیوایەتی کردووە لە ئیبنو موحەیریزەوە وتی: وتم بە ئەبو جومعە: فەرمودەیەکمان بۆ باس بکە لە پێغەمبەرت(ﷺ) بیستبێت، وتی: بەڵێ:فەرمودەیەکی چاکتان بۆدەگێڕمەوە، وتی:ژەمێکی نیوەڕۆمان لەخزمەت پێغەمبەردا(ﷺ) خوارد، ئەبو عوبەیدەی کوڕی جەڕاحمان لە گەڵا بوو وتی: ئەی پێغەمبەری خودا (ﷺ) ئایا کەسێك هەبێ لە ئێمە چاکتر بێت؟ لەگەڵتا مسوڵمان بووین و جیهادیشمان کرد لەگەڵتا. فەرموی: بەڵێ کۆمەڵێکن لە دوای ئێوە بڕوا بە من دێنن و منیشیان نەدیوە.

## مانای نوێژکردن

ئیبنو عەباس ئەڵێت: ﴿وَيُقِيمُونَ ٱلصَّلَوٰةَ﴾ نوێژ دەکەن بە فەرزەکانیەوە[3]. زەححاك لە ئیبنو عەباسەوە ئەڵێت: ﴿وَيُقِيمُونَ ٱلصَّلَوٰةَ﴾ نوێژکردن. واتە: کڕنوش و سوجدەو قورئان خوێندن و گەردن کەچی بەتەواوی و پێشوازی کردنی و بەتەنگەوە بوونی[4]. قەتادەئەڵێت: (إقامة الصلاة) یانی: پارێزگاری لە کاتەکانی نوێژو دەستنوێژو ڕکوع و سوژدەکانیدا[5]. موقاتیلی کوڕی حەیان وتی: (إقامتها) یانی: پارێزگاری لە کاتەکانی و دەستنوێژگرتنی باش و ڕکوع و سوجدەو قورئان خوێندن بەتەواوی لە نوێژداو شایەتومان و سڵاوەت دان لەسەر پێغەمبەر (ﷺ) ئەمە نوێژ کردنی تەواوە[6].

## مەبەست بە بەخشین

---

[1] سەعیدی کوڕی مەنصور /٢/٥٤٤.

[2] ابنأبی حاتم /١/٣٤/، الحاکم/٢/٢٦٠.

[3] الطبری /١/٢٤١.

[4] الطبری /١/٢٤١ ص٣٣.

[5] ابن ابی حاتم /١/٣٧.

[6] ابن ابی حاتم /١/٣٧.

عەلی كوڕی ئەبو تەلحەو كەسانی تریش وتیان لە ئیبنو عەباسەوە: ﴿وَمِمَّا رَزَقْنَاهُمْ يُنفِقُونَ﴾ لەو بژێویەش پێمان داون دەبەخشن. وتی: زەكاتی ماڵەكانیان[1]. سودی ئەڵێت: لە ئەبو مالیك و ئەبو سالمەوە لە ئیبنو عەباس و لە سوڕەوە لە ئیبنو مەسعودو چەندین كەسەوە لە هاوەڵانی پێغەمبەری خوداوە(ﷺ) ئەڵێن: ﴿وَمِمَّا رَزَقْنَاهُمْ يُنفِقُونَ﴾ بەخشینی پیاو بە ماڵ و منداڵی. ئەمە لە پێش ئەوەدا ئایەتی زەكات خوارەوە[2]. جوبەیر ئەڵێت: لە زەححاكەوە: ماڵ بەخشین شتێك بوو خۆیان پێ نزیك دەخستەوە لە خودا بە پێی تواناو تێكۆشانی خۆیان، تا فەرز بوونی زەكات هاتە خوارەوە، كە حەوت ئایەت بوو لە سورەتی بەرائەدا كە باسی ماڵ بەخشینی تیا باس كراوە، ئەو ئایەتانە بونە نەسخ كەرەوەو جێگیر بوەكان[3]. منیش دەڵێم: زۆر جار خودای گەورە نوێژ كردن و ماڵ بەخشینی لەگەڵ یەك هێناوە، چونكە نوێژ كردن هەقی خودایەو پەرستنیەتی كە بریتیە لە خوا پەرستی بە تەنیاو سوپاس و ستایش و پاڕانەوەو هانا پێ بردن و پیشت پێبەستنی. بەڵام ماڵ بەخشین مەبەست پێی چاكە كردنە لەگەڵ خەڵكی و سوود پێگەیاندنیانە. نزیك ترین كەسیش بەو بەخشینە خزم و كەس و كارو بەندەو كەنیزەیە. پاشان كەسانی بێگانەش. هەر بەخشینێكی واجب و زەكاتی فەرز كراو ئەم ئایەتە دەیگرێتەوە كە ئەفەرموێت: (وَمِمَّا رَزَقْنَاهُمْ يُنفِقُونَ) لەو بژێویەی پێمان داون دەبەخشن. هەر بۆیە لە هردوو سەحیحەكەدا هاتووە لە ئیبنو عومەرەوە ڕەزای خوای لێ بێت ئیسلام لەسەر پێنج بنەڕەت دروست كراوە، شایەتی دان كە هیچ شتێ بۆ پەرستن ناشێ جگە لە خودا وە موحەمەد(ﷺ) پێغەمبەری خودایە، نوێژكردن و زەكات دان، ڕۆژوی ڕەمەزان و حەجی ماڵی خوا[4]. فەرمودە لەم بارەیەوە زۆرە.

## مانای نوێژ الصلاة

لە بنچینەدا نوێژ لە زمانی عەرەبیدا پاڕانەوەیە، پاشان نوێژ لە شەرعدا بەكاهاتووە بۆ ئەو ڕكوع و سجود و كردارە تایبەتانە لە چەند كاتێكی دیلری كراودا و بەو مەرجانەی كە زانراوە و ئەو سیفەت و جۆرانەی كە مەشهورە پێی.

خودای گەورە ئەفەرموێت: ﴿وَالَّذِينَ يُؤْمِنُونَ بِمَا أُنزِلَ إِلَيْكَ وَمَا أُنزِلَ مِن قَبْلِكَ وَبِالْآخِرَةِ هُمْ يُوقِنُونَ﴾ وە ئەوانەی كە بڕوا دەهێنن بەو قورئانە بۆ تۆ نێراوە، وە بەو كتێبانەی كە بۆ پێغەمبەرانی پێش تۆ بەڕێ كراوە، وە لەهاتنی ڕۆژی قیامەت هیچ گومانێكیان نیە. ئیبنو عەباس ئەڵێت: ﴿وَالَّذِينَ يُؤْمِنُونَ بِمَا أُنزِلَ إِلَيْكَ وَمَا أُنزِلَ مِن قَبْلِكَ

---

[1] الطبری /١/٢٤٣.

[2] الطبری /١/٢٤٣.

[3] الطبری /١/٢٤٣.

[4] الفتح الباری/١/٦٤/، مسلم/١/٤٥ ص٣٢.

﴿وَبِٱلْآخِرَةِ هُمْ يُوقِنُونَ﴾ یانی: بڕوایان هەیە بەوەی تۆ لەلای خوداوە هێناوتەو بڕوایان هەیە بەو کتێبانەش لە پێش تۆوە ڕەوانە کراوەبۆ پێغەمبەران هیچ جیاوازی ناکەن لە نێوانیاندا و حاشا ناکەن لەوەی کەپێغەمبەران پێی هاتوون لەلایەن پەروەردگاریانەوە[1]. ﴿وَبِٱلْآخِرَةِ هُمْ يُوقِنُونَ﴾ یانی: بڕوایان هەیە بەزیندوو بونەوەو ڕۆژی قیامەت و بەهەشت و ئاگرو لێپرسینەوە و تەرازو[2]. بۆیە ناو نراوە بە ڕۆژی دوایی چونکە دوای دنیا دێت.

## سیفەتەکانی خاوەن باوەڕ

ئەمانەی کە وەسف کراوە لێرە هەر ئەوانەن لە پێشەوە لەو ئایەتەدا کە خودای گەورە ئەفەرموێت:

﴿ٱلَّذِينَ يُؤْمِنُونَ بِٱلْغَيْبِ وَيُقِيمُونَ ٱلصَّلَوٰةَ وَمِمَّا رَزَقْنَٰهُمْ يُنفِقُونَ﴾ ئەو کەسانەی بڕوایان بە نەدیار هەیەو نوێژ دەکەن و لەو بژێویەش کە پێمان داون دەبەخشن. موجاهید ئەڵێت: چوار ئایەت لە سەرەتای سوورەتی بەقەرەوە وەسفی خاوەن باوەڕانە، دوو ئایەتیش دەربارەی ڕەوشتی خوا نەناسانە،سیانزە ئایەتیش دەربارەی دووڕووەکانە[3]. ئەم چوار ئایەتە نیشانەیە بۆ هەر مسوڵمانێ ئەو سیفەتانەی تێدا بێت، ئیتر ئەو کەسە عەرەب بێ یا عەجەمی یا ئەهلی کتێب یا لە مرۆڤ بێ یا لە جنۆکە. هیچ سیفەتێ لەم سیفەتانە بە ڕست دانانرێ بەبێ ئەوی تریان. بەڵکو هەموویان بەیەکەوە بوستراون و مەرجە لەگەڵی. بڕوا بە نەدیارو نوێژکردن و زەکات دان تەواو نابێ بەبێ بڕوا بوون بەوەی کی پێغەمبەری خودا (ﷺ) پێی هاتووەو بەوەیش کە پێغەمبەرانی پێش ئەو سەلامی خوایان لێبێت پێی ڕەوانە کراون و بڕوابوون بە ڕۆژی دوایی. وەك چۆن ئەمانەش نابێ بەبێ بڕوابوون بەوان. خودای گەورە فەرمانی داوە بە خاوەنباوەڕان بەوانە و ئەفەرموێت: ﴿يَٰٓأَيُّهَا ٱلَّذِينَ ءَامَنُوٓا۟ ءَامِنُوا۟ بِٱللَّهِ وَرَسُولِهِۦ وَٱلْكِتَٰبِ ٱلَّذِى نَزَّلَ عَلَىٰ رَسُولِهِۦ وَٱلْكِتَٰبِ ٱلَّذِىٓ أَنزَلَ مِن قَبْلُ﴾[4] ئەی کۆمەڵی خاوەنباوەڕان! جگە لەوەی بڕواتان بە خوا هێناوە،دەبێ بڕواتان بە پێغەمبەرەکەی هەبێ و بڕواشتان بەو قورئانە هەبێ بۆ پێغەمبەری ناردووەو بڕواتان بەو کتێبەش بێت کە بەر لە قورئان ناردویە. وە ئەفەرموێت: ﴿وَلَا تُجَٰدِلُوٓا۟ أَهْلَ ٱلْكِتَٰبِ إِلَّا بِٱلَّتِى هِىَ أَحْسَنُ إِلَّا ٱلَّذِينَ ظَلَمُوا۟ مِنْهُمْ ۖ وَقُولُوٓا۟ ءَامَنَّا بِٱلَّذِىٓ أُنزِلَ إِلَيْنَا وَأُنزِلَ إِلَيْكُمْ وَإِلَٰهُنَا وَإِلَٰهُكُمْ وَٰحِدٌ﴾[1]

---

[1] الطبري /١/٢٤٤.

[2] ابن ابی حاتم /١/٣٩.

[3] الطبري /١/٢٣٩.

[4] النساء ١٣٦.

وَٰحِدٌ ﴾[1] ئەگەر لەگەڵ ئەهلی کتێب دەکەونە وتوو ویژەوە، بەوپەڕی نەرم ونیانی قسەیان لەگەڵ بکەن. مەکێن لەگەڵ ئەوانەیان کە ناهەقی یان کردوە. ئێوە بڵێن: بەو قورئانە کە بۆ ئێمە هاتە خوارو بەو کتێبەی بۆ ئێوە هاتۆتە خوارێ، بروا دەکەین، خودای ئێمەو خودای ئێوە هەر یەکێکە. وە ئەفەرموێت: ﴿ يَٰٓأَيُّهَا ٱلَّذِينَ أُوتُواْ ٱلْكِتَٰبَ ءَامِنُواْ بِمَا نَزَّلْنَا مُصَدِّقًا لِّمَا مَعَكُم ﴾[2] ئەی ئەوانەی لە پێشدا کتێبی خوداتان بۆ هاتووە! بروا بێنن بەمەی ئێمە ناردومانەتە خوارەوە، کە بڕوای بەوانەش هەیە وان لە کتێبەکەی ئێوەدا. وە ئەفەرموێت: ﴿ قُلْ يَٰٓأَهْلَ ٱلْكِتَٰبِ لَسْتُمْ عَلَىٰ شَىْءٍ حَتَّىٰ تُقِيمُواْ ٱلتَّوْرَىٰةَ وَٱلْإِنجِيلَ وَمَآ أُنزِلَ إِلَيْكُم مِّن رَّبِّكُمْ ﴾[3] بلێ: ئەهلی کتێب ئێوە تا بە پێی تەورات وئینجیل و هەرچی لە پەروەردگارتانەوە بۆتان هاتۆتە خوارەوە نەجوڵێنەوە، ئێوە لەسەر هیچ دینێك بین. وە خودای گەورە دەربارەی گشت خاوەنباوەڕان ئەفەرموێت: ﴿ ءَامَنَ ٱلرَّسُولُ بِمَآ أُنزِلَ إِلَيْهِ مِن رَّبِّهِۦ وَٱلْمُؤْمِنُونَ ۚ كُلٌّ ءَامَنَ بِٱللَّهِ وَمَلَٰٓئِكَتِهِۦ وَكُتُبِهِۦ وَرُسُلِهِۦ لَا نُفَرِّقُ بَيْنَ أَحَدٍ مِّن رُّسُلِهِۦ ﴾[4] ئەم پێغەمبەرەو ئەوانەی لەگەڵ ئەو باوەڕیان هێناوە،لێیان ڕونە کە ئەو شتە لەلایەن پەروەردگاریانەوە هاتۆتە خوارێ بۆ لایان، بروا دەکەن بە خوداو فریشتەکانی و کتێبەکانی و هەموو پێغەمبەرانی و دەڵێن ئێمە بۆ هیچ لا لە پێغەمبەرانی فەرق و جیاوازی دانانێین. وە ئەفەرموێت: ﴿ وَٱلَّذِينَ ءَامَنُواْ بِٱللَّهِ وَرُسُلِهِۦ وَلَمْ يُفَرِّقُواْ بَيْنَ أَحَدٍ مِّنْهُمْ ﴾[5] ئەوانەش کە باوەڕیان هەیە بە خوداو پێغەمبەرەکانی و وە لە نێویاندا فەرق و جیاوازی دانانێن. وە چەندین ئایەتی تریش کە فەرمان دەکا بە خاوەنباوەڕان کە بروایان ببێ بە خوداو پێغەمبەرانی و کتێبەکانی. بەڵام خاوەنباوەڕی ئەهلی کتێب تایبەتمەندیەکیان هەیە، ئەوەیش ئەوان بروایان هەیە بەو کتێبەی کە بۆیان هاتووە بە تەواوی لەبەر ئەوە دوو جار پاداشت وەردەگرن، بەڵام غەیرەز ئەوان باوەڕدەهێنن بەوەی پێش خۆیان بە گشتی وەك لە فەرمودەی سەحیحدا هاتووە: ئەگەر ئەهلی کتێب قسەیان بۆ کردن بە درۆیان مەخەنەوەو بڕواشیان پێمەکەن، بەڵکو بڵێن: بڕوامان هێناوە بەوەی بۆمان هاتۆتە خوارەوە و بەوەیش بۆ ئێوە هاتۆتە خوارەوە[6]. بەڵام دەشێ بروای زۆرێ لە عەرەبەکان بەو ئیسلامەی

---

[1] العنكبوت ٤٦.

[2] النساء ٤٧.

[3] المائدة ٧٦.

[4] البقرة ٢٨٥.

[5] النساء ١٥٢.

[6] أبو داود /٥٩/٤ ص٣٤ /سەحیحە.

کە موحەمەد (ﷺ) پێی هات ڕێك و پێك و گشتگیر ترو تەواو تر بێ لە بڕوای ئەوانەی ئەهلی کتێب کە هاتونەتە ناو ئیسلام ئەوان هەرچەندە دوو پاداشتیان هەیە لەو بارەیەوە، غەیرەز ئەوانیش ئەو پاداشتەیان بەدەست هێناوە بەهۆی ئەو بڕوا هێنانەیان کە زیاترە لەو دوو پاداشتەی ئەوان بە دەستیان هێناوە. و الله أعلم.

## ڕێی ڕاست و ڕزگاری بەشی خاوەن باوەڕانە

خودای گەورە ئەفەرموێت: ﴿أُوْلَٰٓئِكَ عَلَىٰ هُدٗى مِّن رَّبِّهِمۡۖ وَأُوْلَٰٓئِكَ هُمُ ٱلۡمُفۡلِحُونَ﴾ ئەوانە پەروەردگاریان ڕێ نیشاندەریانە و دیارە هەر ئەوانە ڕزگارن(أُوْلَٰٓئِكَ) کە وەسف کران بەوەی کە باس کرا لە بڕوا بە نەدیار و بە نوێژ کردن و بەخشینی ماڵ لەو ڕۆزیەی کە خودا پێی داون و باوەڕ بەو قورئانەی کە هاتۆتە خوارەوە بۆ پێغەمبەر(ﷺ) ئەو پێغەمبەرانەش لە پێشەوە هاتوون و گومانیان نیە لە هاتنی ڕۆژی قیامەت. کە پێویستە خۆی بۆ ئامادە بکرێت بە کردنی ئاکاری چاك و واز هێنان لە قەدەغە کراوەکان (عَلَىٰ هُدٗى)یانی: لەسەر ڕوناکی و ڕێمایی و چاوڕۆشنین لە لایەن خودای گەورەوە ﴿وَأُوْلَٰٓئِكَ هُمُ ٱلۡمُفۡلِحُونَ﴾ واتە: هەر ئەوانە ڕزگارن لە دنیاو لە ڕۆژی قیامەتا بەوەی کە بەدوایدا دەگەڕان پێی گەیشتن و ڕزگاریان بوو لە خراپەی ئەوە لە دەستی ڕایان دەکرد. پاداشتی خۆیان وەرگرت و بەهەشتی هەتا هەتاییشیان وەدەس هێنا. لەو سزایەش ڕزگاریان بوو کە خودا سازی داوە بۆ دوژمنانی خودا.

﴿إِنَّ ٱلَّذِينَ كَفَرُواْ سَوَآءٌ عَلَيۡهِمۡ ءَأَنذَرۡتَهُمۡ أَمۡ لَمۡ تُنذِرۡهُمۡ لَا يُؤۡمِنُونَ ۝٦﴾

خودای گەورە ئەفەرموێت: ﴿إِنَّ ٱلَّذِينَ كَفَرُواْ سَوَآءٌ عَلَيۡهِمۡ ءَأَنذَرۡتَهُمۡ أَمۡ لَمۡ تُنذِرۡهُمۡ لَا يُؤۡمِنُونَ﴾ کۆمەڵی خوا نەناس بترسێنی یان نەی ترسێنی وەك یەکە، باوەڕ ناهێنن. واتە: هەقیان داپۆشیوە و شاردویانەتەوە، خودای گەورە ئەوەی لەسەر نوسیون، بیان ترسێنی یان نەیان ترسێنی هەرگیز باوەڕ ناهێنن، بەو پەیامەی تۆ بۆت هێناون ئەی موحەمەد(ﷺ) وەك لە ئایەتێکی تریشا ئەفەرموێت: ﴿إِنَّ ٱلَّذِينَ حَقَّتۡ عَلَيۡهِمۡ كَلِمَتُ رَبِّكَ لَا يُؤۡمِنُونَ ۝٩٦ وَلَوۡ جَآءَتۡهُمۡ كُلُّ ءَايَةٍ حَتَّىٰ يَرَوُاْ ٱلۡعَذَابَ ٱلۡأَلِيمَ﴾[1] ئەو کەسانەی گفتی پەروەردگاری تۆیان لێهاتە دی، ئیتر باوەڕ ناهێنن، جا با هەموو نیشانەیەکیشیان بۆبێ، تا ئازاری بە ژان بە چاوی خۆیان دەبینن. وە خودای گەورە دەربارەی ئەو لاسارانەی ئەهلی کتێب ئەفەرموێت: ﴿وَلَئِنۡ أَتَيۡتَ ٱلَّذِينَ أُوتُواْ ٱلۡكِتَٰبَ بِكُلِّ ءَايَةٖ مَّا تَبِعُواْ قِبۡلَتَكَۚ﴾[2] ئەهلی کتێب هەر

---

[1] یونس ٩٦-٩٧.

[2] البقرة ١٤٥.

نیشانەیەکیان نیشان بدەی ڕوو لە ڕووگەکەی تۆ ناکەن، واتە: ئەو کەسەی خودا بەدبەختی بۆ نوسیبوو،هەرگیز بەختەوەر نابێت وە هەرکەسێ خودا گومڕای کرد هیچ کەس ناتوانێ شارەزای بکا. تۆ ئەی مەحەمەد(ﷺ)! هیچ دلگران مەبە و خەفەتیان بۆ مەخۆ، تۆ ئەو پەیامەیان پێ ڕاگەیەنە، هەرکەسێ لێی وەرگرتی ئەوە بەشێکی باشی بۆ خۆی بردووە. هەرکەسیش پشتی هەلکردو و وەری نەگرت دلگران مەبە بۆی و گوێی پێ مەدە لەسەر ئەوە کە وەری ناگرێ: ﴿فَإِنَّمَا عَلَيْكَ ٱلْبَلَٰغُ وَعَلَيْنَا ٱلْحِسَابُ﴾[1] تۆ هەر ئەوەندەت لەسەرە کە ڕایگەیەنی و لێپرسینەوەش لەسەر ئێمەیە. وە ئەفەرموێت: ﴿إِنَّمَآ أَنتَ نَذِيرٌ وَٱللَّهُ عَلَىٰ كُلِّ شَيْءٍ وَكِيلٌ﴾[2] تۆ تەنیا ترسێنەرێکی و هەر خودایە کە چاودێری هەموو شتە. عەلی کوڕی ئەبو تەلجە لە ئیبنو عەباسەوە ئەلێت: لەم ئایەتەدا ﴿إِنَّ ٱلَّذِينَ كَفَرُوا۟ سَوَآءٌ عَلَيْهِمْ ءَأَنذَرْتَهُمْ أَمْ لَمْ تُنذِرْهُمْ لَا يُؤْمِنُونَ﴾ کۆمەلی خوا نەناسان بترسێنی یان نەیان ترسێنی وەك یەکە، باوەڕ ناهێنن. ئەلێت: پێغەمبەری خودا زۆر حەزی دەکردو هەوڵی ئەدا کە هەموو خەلکی باوەڕ بهێنن لەسەر ئەو ڕێگە ڕاستە شوێنی کەون، خودای گەورە ئاگاداری کرد کە ئەوانە نەبێ کە خودای گەورە لە پێشا بەختەوەری کردوون لە کتێبی یەکەمدا هیچ کەسیش گومڕا نابێ مەگین کەسێ خودا لە پێشا بەدبەختی کردبێ لە کتێبی هەوەڵدا[3].

﴿خَتَمَ ٱللَّهُ عَلَىٰ قُلُوبِهِمْ وَعَلَىٰ سَمْعِهِمْ ۖ وَعَلَىٰٓ أَبْصَٰرِهِمْ غِشَٰوَةٌ ۖ وَلَهُمْ عَذَابٌ عَظِيمٌ ۝٧﴾

**ماناى مۆر ( الختم )**

خودای گەورە ئەفەرموێت: ﴿خَتَمَ ٱللَّهُ عَلَىٰ قُلُوبِهِمْ وَعَلَىٰ سَمْعِهِمْ ۖ وَعَلَىٰٓ أَبْصَٰرِهِمْ غِشَٰوَةٌ ۖ وَلَهُمْ عَذَابٌ عَظِيمٌ﴾ لەلایەن خوداوە دلّ و گوێیان مۆرکراوە، پەردەیەکیش بەبەر چاویاندا کشاوەو بەشیان ئازاری زۆر گەورەیە. سودی ئەلێت: ﴿خَتَمَ ٱللَّهُ﴾ یانی: خودا مۆری ناوە. قەتادە لەم ئایەتەدا ئەلێت: شەیتان زالّ بووە بەسەریاندا و بونەتە گوێ لە مشتی شایتان، خودایش مۆری ناوە بەسەر دلّ و گوێیاندا و پەردەیشی کێشاوە بەسەر چاویاندا، ڕێگەی ڕاست نابینن و نە دەبیستن و نە تێدەگەن و نە ئاوەزیان هەیە[4]. ئیبنو جەریر لە موجاهید ئەلێت: ﴿خَتَمَ ٱللَّهُ عَلَىٰ قُلُوبِهِمْ﴾ یانی: مۆر. تاوانەکان لەسەر

---

[1] الرعد ٤٠.

[2] هود ١٢.

[3] ابن ابی حاتم /١/٤٤.

[4] ابن ابی حاتم /١/٤٤ ص٣٤.

دڵ کۆدەبێتەوە و لە گشت لایەکەوە دەوری ئەدات تا دەیگرێت و ئەو چاپە لەسەری دادەنرێ یانی: مۆر[1]. ئیبنو جوریج ئەڵێت: مۆرەکە لەسەر دڵو گوێیە[2]. ئیبنو جوریج ئەڵێت: عەبداللەی کوڕی کەسیر بۆی گێڕامەوە لە موجاهیدەوە کە بیستویەتی لە موجاهیدەوە دەیوت: ژەنگ (الران) ساناترە لە مۆر، مۆریش ئاسانترە لە داخستن لە قفڵ دان، بێگومان قوفڵ دان لەوان بەهێزترە[3]. ئەعمەش ئەڵێت: موجاهید بەدەستی پیشانی داین و وتی: ئەوان وایان داناوە کە دڵ وەك ئەمە وایە، یانی ناو لەپ کاتێ کەعەبد گوناهێکی کرد لێی دەچێتە یەك، پەنجە توتەی قوچی لکانی بەناو لەپیەوە کاتێ گوناهی کرد دەقوچێ پەنجەیەکی تری قوچی. وە کاتێ گوناهی کرد دەقوچێ. پەنجەیەکی تری قوچی. تا هەموو پەنجەکانی خۆی قوچی. پاشان وتی: مۆری لەسەر دادەنرێ. موجاهید ئەڵێت: ئەوان وایان دەزانی ئەوە ژەنگە[4]. قورتوبی ئەڵێت: زانایانی ئەم ئومەتە کۆدەنگن لەسەر ئەوە کە خودای گەورە وەسفی خۆی کردووە بە مۆر و چاپ لەسەر دڵی خوانەناسان لە پاداشتی ئەو خوانەناسیەیاندا. وەك ئەفەرموێت: ﴿بَلۡ طَبَعَ ٱللَّهُ عَلَيۡهَا بِكُفۡرِهِمۡ﴾[5] نەخەیر وانیە! بەڵکو خودا مۆری ناوە بەسەر دڵەکانیاندا بە هۆی خوا نەناسیانەوە. وە باسی فەرمودەی هەڵگێڕانەوەی دڵەکانی کردووە: (یامقلب القلوب ثبت قلوبنا علی دینك) یانی: ئەی ئەو کەسەی دڵەکان هەڵوگێڕ دەکەی! دڵەکانمان لەسەر ئاینەکەت جێگیر کە[6]. وەپاشان فەرمودە سەحیحەکەی حوزەیفەی هێناوە کە پێغەمبەری خودا(ﷺ) ئەفەرموێت: (تعرض الفتن علی القلوب کالحصیر عوادا عوادا، فأي قلب أشربها نکت فیة نکتة بیضاء حتی تصیر علی قلبین، علی أبیض مثل الصفا فلا تضره فتنة مادامت السموات والارض، والاخر أسود مربادا کالکوز مجحیا لا یعرف معروفا ولا ینکر منکرا) واتە: لەمەولا فیتنەو ئاشوب دێت بەسەر دڵاندا وەك چۆن حەسیر تاڵ تاڵ لەسەر یەك دادەنرێت، هەر دڵێکیش هەڵی مژێت زوو بیمژێت ئەوا خاڵێکی ڕەشی تێدا دروست دەبێت، بەڵام هەر دڵێك حەزی پێ نەکا ئەوە خاڵێکی سپی تێدا دروست دەبێ، تاوەکو دڵەکان دەبن بە دوو جۆر دڵ، دڵێکی سپی و سافی وەك قوماشی سپی و ساف، هیچ فیتنەیەك زیانی لێ نادات چەندە ئاسمانەکان و زەوی بەردەوام بن. دڵەکەی تریشیان دڵێکی ڕەش و تاریك وەك

---

[1] ابن ابی حاتم /١٤٤/١ ص٣٥.

[2] الطبری /٢٥٩/١.

[3] الطبری /٢٥٩/١.

[4] الطبری /٢٥٨/١.

[5] النساء ١٥٥.

[6] الترمزی /٢١٤٠/٣٥٨٧/، ابن ماجة/٣٨٣٤ /سەحیحە.

گزەی سەر بەرەو خوارو نەچاك بە چاك دەزانیٚ و نە خراپ بە خراپ[١]. ئیبنو جەریرئەڵێت: ڕاستیەکەی ڕای من لەو بارەیەوە ئەو فەرمودەیە بە وێنەی ئەو هاتووە لە پێغەمبەری خوداوە(ﷺ) فەرموویەتی: (إن المومن إذا أذنب ذنبا كانت نكتة سوداء في قلبه، فإن تاب نزع واستعتب صقل قلبه، وإن زاد زادت حتى تعلو قلبه، فذلك الران الذي قال الله تعلى: ﴿ كَلَّا بَلْ رَانَ عَلَىٰ قُلُوبِهِم مَّا كَانُوا يَكْسِبُونَ ﴾، یانی: هەر خاوەنباوەڕێك گوناهێکی کرد خاڵێکی ڕەش لەناو دڵی پەیدا دەبێت، جا ئەگەر تەوبەی کرد و پەشیمان بوەوە، ئەوا لێی پاك دەبێتەوە، ئەگەر نا ووردە ووردە زیاد دەکا تا بەتەواوی دڵی ژەنگ دەگرێت، هەر ئەوەیە کە خودای گەورە ئەفەرموێت: نەخەیەر وانیە! بەڵکو ئەوان ژەنگی کارەکانی خۆیان بوەتە توێژێکی سەر دڵیان[٢]. تیرمزی و نەسائی و ئیبنو ماجە ڕیوایەتیان کردووە. تیرمزی ئەڵێت: فەرموودەیەکی حەسەنی سەحیحە[٣].

## ماناى پەردە (غشاوە)

وە بزانە وەستانی تەواو لەسەر ئەم دەقەیە کە خودای گەورە ئەفەرموێت: ﴿ خَتَمَ اللَّهُ عَلَىٰ قُلُوبِهِمْ وَعَلَىٰ سَمْعِهِمْ ﴾ وە ﴿ وَعَلَىٰ أَبْصَارِهِمْ غِشَاوَةٌ ﴾ ڕستەیەکی تەواوە. بێگومان مۆر لەسەر دڵ و لەسەر گوێیەو پەردەیش لەسەر چاوە. وەك سودی لە تەفسیرەکەیدا ئەڵێت: لە ئیبنو عەباسەوە لە ئیبنو مەسعودەوە لە چەندین کەسەوە لە هاوەڵەکانی پێغەمبەر(ﷺ) لەم ئایەتەدا ﴿ خَتَمَ اللَّهُ عَلَىٰ قُلُوبِهِمْ وَعَلَىٰ سَمْعِهِمْ ﴾ وتیان: نە ئاوەزیان هەیە و نە دەبیستن وە پەردەیش لەسەر چاویان دانراوە و نابینن[٤].

## باسی دووڕووەکان

لەپێشەوە وەسفی خاوەنباوەڕان لە سەرەتای ئەم سوورەتەدا کرا لە چوار ئایەتا وە پاشان بەم دوو ئایەتەیش باسی خوانەناسان کراو ناوهێنران. خودای گەورە دێتە سەر دووڕووەکان و باسی هەڵسو کەوتیان دەکات کە خۆیان بە خاوەنباوەڕ دەردەخەن کەچی لە دڵا خوا نەناسن لەبەر ئەوەی زۆریٚ لە خەڵکی لێیان تێك دەچیٚ و باش نایان ناسن بە درێژی و بەتەواوی بە چەندین شێوە باس کراون کە ژیانیان پڕە لە دووڕویی، وەك سوورەتی بەڕائەت و سوورەتی مونافقین دەربارەیان هاتۆتە خوارەوەو لە سوورەتی نور سورەتی تریشدا هەر خودا باسی کردوون و پێناسەی ژیانی کردوون بۆ ئەوەی لێیان دوورکەونەوەوەولەو کەسانەش وەك ئەوان هەڵسوکەوت دەکەن.

---

[١] مسلم /١/١٢٨ ص٣٥.

[٢] الطبرى /١/٢٦٠.

[٣] تحفة الاحوذى /٩/٢٤٥، النسائى فى الكبرا /٦/٥٠٩، ابن ماجة/٢/١٤١٨/حەسەنە.

[٤] الطبرى /١/٢٦٦.

﴿وَمِنَ ٱلنَّاسِ مَن يَقُولُ ءَامَنَّا بِٱللَّهِ وَبِٱلْيَوْمِ ٱلْءَاخِرِ وَمَا هُم بِمُؤْمِنِينَ ﴿٨﴾ يُخَٰدِعُونَ ٱللَّهَ وَٱلَّذِينَ ءَامَنُوا۟ وَمَا يَخْدَعُونَ إِلَّآ أَنفُسَهُمْ وَمَا يَشْعُرُونَ ﴿٩﴾﴾

**مانای دووڕوویی (النفاق)**

دوڕوویی بریتیە لە دەرخستنی چاکەو شاردنەوەی خراپە. ئەمەیش چەند جۆرێکە: بیرو بڕوایی: ئەوەیە کە خاوەنەکەی هەتا هەتایی دەکا لەناو ئاگردا، کە لە گوناهە زۆر گەورەکانە لە شوێنی خۆیدا بە درێژی باسی دەکرێ بە یارمەتی خودای گەورە، ئەمە وەك ئەوە وایە کە ئیبنو جورەیج دەڵێ: دووڕو قسەی پێچەوانەی کرداریەتی و نهێنی پێچەوانەی ئاشکرایەتی و دەرەوەو ناوەوەی وەك یەك نیە، لە پاشملە جۆرێکە و لە ڕوو جۆرێکی ترە.

**سەرەتای دووڕوویی**

کاتێ کەسیفەتی دووڕووەکان هاتە خوارەوە لە سوورەتەکانی مەدینەدا، چونکە لەناو مەککەدا دووڕو نەبوو، بەڵکو بە پێچەوانەوە بوو، لەمەککەدا لەبەر ناچاری هەنێ کەس وای دەردەخست بێباوەڕە، کەچی لە دڵدا خاوەنباوەڕ بوو. کاتێ کە پێغەمبەری خودا(ﷺ) کۆچی کرد بۆ مەدینە، ئەوس و خەزرەجیەکانی تێدا بوو لە ئەنساریەکان، لە چەرخی نەفامیدا بتیان دەپەرست لەسەر ڕێبازی بتپەرستەکانی عەرەب. ئەهلی کتێبیشی تێدا بوو لە جوولەکەکان کە لەسەر ڕێبازی پێشینەکان بوون. کە سێ تیرە بوون: بەنو قینقاع کە هاوپەیمانی خەزرەج بوون، بەنو نەزیرو بەنو قورەیزەش هاوپەیمانی ئەوس بوون. کاتێ کە پێغەمبەری خودا(ﷺ) هاتە مەدینە، ئەوەی مسوڵمان بوو موسوڵمان بوو لە هۆزی ئەوس و خەزرەج لە ئەنصاریەکان. جوولەکەکان زۆر کەم مسوڵمان دەبوون، عەبداللەی کوڕی سەلام مسوڵمان بوو ڕەزای خوای لێبێت، لەو کاتەدا دووڕوویش نەبوو چونکە مسوڵمانان هێشتا خاوەنی دەسەڵات نەبوون تا کەس لێیان بترسێ، پێغەمبەری خودا(ﷺ) هەوڵی ئەدا کێشە لەگەڵ جوولەکەو زۆر هۆزی تریش لە عەرەبەکانی دەوری مەدینە پەیدا نەبێ. بەڵام دوای جەنگی بەدر کە خودای گەورە وتەی خۆی بەرز کردەوەو ئیسلامی سەرخست و کردنیە خاوەن دەسەڵات. عەبداللەی کوڕی ئوبەی کوڕی سەلوول کە سەرکردە بوو لە مەدینەدا و لە خەزرەجیەکان بوو، گەورەی دوو هۆزیش بوو لە چەرخی نەفامیدا، کە نیازیان وابوو بیکەنە بەرپرسی خۆیان، خەڵکەکە مسوڵمان بوون کاتێ ئەو خێرەیان بەسەرا ڕژا وازیان لەو هێنا، عەبداللەی کوڕی ئوبەی، هەر وردە کردی دڵی خۆی دەکرد دەربارەی ئیسلام و ئەو خەڵکە مسوڵمانە، کاتێ کە جەنگی بەدر ڕوویدا وتی: ئەمە فەرمانی خودایەو هاتوە، مسوڵمان بونی خۆی ئاشکرا کرد، چەند کۆمەڵی تریش کە لە سەر ڕێبازی ئەو بوون و هاوشێوەی خۆی بوون و هەندێکیش لە ئەهلی کتێب مسوڵمان بوون لەگەڵی. ئاڵەو

کاتەدا دووڕوویی پەیدا بوو لەناو خەڵکی مەدینەو دەوروبەریدا لە عەرەبەکان. بەڵام کۆچەریەکان هیچ کەسێکیان لەناودا نەبوو دووڕوویی کردبێ. چونکە هیچ کەسێ بە زۆر کۆچی پێنەکرابوو، بەڵکو کۆچی کردبوو ماڵ و منداڵ و زێدی خۆی بە جێ هێشتبووبە خواستی خۆی بۆ ئەو پاداشتەی لەلای خودایە لە ڕۆژی دوایدا.

### تەفسیری دوو ئایەتەکە (٨،٩)

مەحەمەدی کوڕی ئیسحاق ڕیوایەتی کردووە لە ئیبنو عەباسەوە لەم ئایەتەدا کە خودای گەورە ئەفەرموێت: ﴿وَمِنَ ٱلنَّاسِ مَن يَقُولُ ءَامَنَّا بِٱللَّهِ وَبِٱلْيَوْمِ ٱلْءَاخِرِ وَمَا هُم بِمُؤْمِنِينَ﴾ لەم خەڵکەدا هی وا هەیە دەڵێن: باوەڕیان بە خوداو ڕۆژی دوایی هێناوە، کەچی باوەڕیشیان نیە. وتی: مەبەست پێی دووڕووەکانی ئەوس و خەزرەج و ئەوانەش وەك ئەوان بوون[1]. ئەبولعالیە و حەسەن و قەتادە و سودی هەروا تەفسیریان کردووە، وتویانە: مەبەست پێی دووڕووەکانی ئەوس و خەزرەجە. هەربۆیە خودای گەورە ئاگاداری داوە دەربارەی دووڕووەکان، تا خاوەنباوەڕان هەڵنەخەڵەتێن بە ڕووکەشی دووڕووەکان، بەهۆی ئەوانەوە توشی خراپەو بەدکاری ببن ئەگەر خۆیان نەپارێزن لێیان. وا بزانن بڕوایان هەیە کەچی ئەوانە لە ڕاستیدا خوانەناسن. ئەمە لەو شتە زۆر گەورە قەدەغە کراوانەیە کە هیوای چاکە بەرێ لە خەڵکی بەدکارو خوانەناس. خودای گەورە ئەفەرموێت: ﴿إِذَا جَآءَكَ ٱلْمُنَٰفِقُونَ قَالُوا۟ نَشْهَدُ إِنَّكَ لَرَسُولُ ٱللَّهِ ۗ وَٱللَّهُ يَعْلَمُ إِنَّكَ لَرَسُولُهُۥ﴾[2] کاتێ دووڕو دێنە لای تۆ دەڵێن: شایەتیت بۆ ئەدەین کە تۆ پێغەمبەری خودای، خواش دەزانێ کە تۆ پێغەمبەری ئەوی. واتە: ئەوانە کە هاتنە لات دەڵێن: نەك لە ڕاستیدا چونکە ئەوانە بێ بڕوان هەربۆیە لە شایەتیەکەیاندا جەخت دەکەنەوە بە (أن ولام) تەئکید لەسەر قسەکەیان و دەڵێن: بڕوامان بە خوداو ڕۆژی قیامەت هێناوە. بەڵام لە ڕاستیدا وا نیە. وەك خودای گەورە بە درۆی خستونەتەوە لەو قسەو شایەتیەیاندا دەربارەی بیروباوەڕیان و ئەفەرموێت: ﴿وَٱللَّهُ يَشْهَدُ إِنَّ ٱلْمُنَٰفِقِينَ لَكَٰذِبُونَ﴾[3] خودا شایەتە کە بەڕاستی هەرچی دووڕون درۆزنن. وە ئەفەرموێت: ﴿وَمَا هُم بِمُؤْمِنِينَ﴾ کەچی ئەوانە بڕوا دار نین. پاشان خودای گەورە ئەفەرموێت: ﴿يُخَٰدِعُونَ ٱللَّهَ وَٱلَّذِينَ ءَامَنُوا۟﴾ئەوان خوداو خاوەنباوەڕان فریو ئەدەن. واتە: خۆیان وا دەردەخەن کە خاوەنباوەڕن، بە نەهێنیش لە دلا خوا نەناسن بە نەفامی و نەزانی خۆیان وا دەزانن خودا بەوە فریو

---

[1] الطبری /١/٢٦٩.

[2] المنافقون ١.

[3] المنافقون ١.

ئەدەن و ئەوە باشە بۆیان برەو بەو کارەیان ئەدەن، وەك چۆن لە نێوان مسوڵمانەکاندا دەیانکردو برەویان پێئەدا. وەك خودای گەورە ئەفەرموێت: ﴿يَوْمَ يَبْعَثُهُمُ ٱللَّهُ جَمِيعًا فَيَحْلِفُونَ لَهُۥ كَمَا يَحْلِفُونَ لَكُمْ وَيَحْسَبُونَ أَنَّهُمْ عَلَىٰ شَيْءٍ ۚ أَلَآ إِنَّهُمْ هُمُ ٱلْكَـٰذِبُونَ﴾[1] ڕۆژێ کە خودا گشتیان زیندوو دەکاتەوە، ئەوسا سوێند بۆ ئەو دەخۆن، وەك بۆ ئێوە سوێند دەخۆن، لاشیان وایە شتێکیان بە دەستەوەیە، باش بزانن کە ئەمانە درۆزنن. هەر بۆیە خودای گەورە دەربارەی بیروباوەڕیان وەڵامیان ئەداتەوەو ئەفەرموێت: ﴿وَمَا يَخْدَعُونَ إِلَّآ أَنفُسَهُمْ وَمَا يَشْعُرُونَ﴾ کە هەر خۆیان فریو داوە بەڵام هەستی پێناکەن. واتە: بەو کردارەیان هەر خۆیان هەڵخەڵەتاندوە بەڵام ئەوانە بە خۆیان نازانن. وەك خودای گەورە ئەفەرموێت: ﴿إِنَّ ٱلْمُنَـٰفِقِينَ يُخَـٰدِعُونَ ٱللَّهَ وَهُوَ خَـٰدِعُهُمْ﴾[2] دووڕووەکان دەیان هەوێ خودا فریو بدەن کەچی خودا دەیان خەڵەتێنێ. ئیبنو ئەبو حاتەم ڕیوایەتی کردووە لە ئیبنو جورەیجەوە لەم دەقەدا کە خودای گەورە دەفەرموێت: ﴿يُخَـٰدِعُونَ ٱللَّهَ﴾ دەیان هەوێ خودا فریو دەن. وتی: بەدەم دەڵێن: (لا إله إلا الله) دەیان هەوێ بەوە ماڵ و گیان و خوێنی خۆیان بپارێزن[3]. سەعید ئەڵێت: لە قەتادەوە لەم دوو ئایەتەدا کە خودای گەورە ئەفەرموێت: ﴿وَمِنَ ٱلنَّاسِ مَن يَقُولُ ءَامَنَّا بِٱللَّهِ وَبِٱلْيَوْمِ ٱلْـَٔاخِرِ وَمَا هُم بِمُؤْمِنِينَ ﴿٨﴾ يُخَـٰدِعُونَ ٱللَّهَ وَٱلَّذِينَ ءَامَنُوا۟ وَمَا يَخْدَعُونَ إِلَّآ أَنفُسَهُمْ وَمَا يَشْعُرُونَ﴾ لەم خەڵکەدا هی وا هەیە دەڵێن: باوەڕمان بە خوداو بە ڕۆژی قیامەت هێناوە، کەچی باوەڕیشیان نیە، ئەوان خوداو باوەڕداران فریو ئەدەن. کە هەر خۆیان فریو داوەو پێشی نازانن. دووڕو وەسف کراوە لەلای کەسێ: ڕەوشت نزمن، بەدەم ڕاست دەڵێ بە دڵی حاشا دەکا، بە کرداریش دژایەتی دەکا. بەیانی لەسەر حاڵێکەو ئێوارەیش لەسەر حاڵێکی تر، دیسان ئێوارە لەسەر حاڵێکە و بەیانی لەسەر حاڵێکی تر. خۆی ڕێك دەخات وەك ڕێکخستنی کەشتی هەرکاتێ هەوا بۆ کوێ هەڵکا ئەویش لەگەڵی دەڕوات[4].

---

[1] المجادلة ١٨.

[2] النساء ١٤٢.

[3] ابن ابی حاتم /٤٦/١ ص٣٦.

[4] ابن ابی حاتم /٤٧/١ ص٣٦.

﴿ فِي قُلُوبِهِم مَّرَضٌ فَزَادَهُمُ اللَّهُ مَرَضًا وَلَهُمْ عَذَابٌ أَلِيمٌ بِمَا كَانُوا يَكْذِبُونَ ﴿١٠﴾ ﴾

**مەبەست بە نەخۆشی**

خودای گەورە ئەفەرموێت: ﴿ فِي قُلُوبِهِم مَّرَضٌ فَزَادَهُمُ اللَّهُ مَرَضًا وَلَهُمْ عَذَابٌ أَلِيمٌ بِمَا كَانُوا يَكْذِبُونَ ﴾ دڵیان نەخۆشی هەیەو خودا نەخۆشی زیاتر کردوون، لەسەر ئەم درۆ کردنە، بەشیان ئازاری بەژانە. سودی ئەڵێت لە ئەبو مالیکەوە لە ئەبو سالحەوە لە ئەبو عەباسەوە لە مورەی هەمەدانیەوەلە ئیبنو مەسعودەوە لە هەندێ کەس لە هەوەڵەکانی پێغەمبەری خوداوە(ﷺ) لەم ئایەتەدا: ﴿ فِي قُلُوبِهِم مَّرَضٌ ﴾ ئەڵێت: لەناو دڵیاندا گومان هەیە ﴿فَزَادَهُمُ اللَّهُ مَرَضًا﴾ خودایش گومانەکەیان زیاتر دەکا[١]. موجاهید و عیکرەمەو حەسەنی بەسری و ئەبو عالیە و ڕەبیعی کوڕی ئەنەس و قەتادەش هەروایان وتووە[٢]. عەبدولڕەحمانی کوڕی زەیدی کوڕی ئەسلەم ئەڵێت: ﴿ فِي قُلُوبِهِم مَّرَضٌ ﴾ ئەڵێت: ئەم نەخۆشیە لە ئایندایە نەخۆشی ناو لاشە نیە ئەوانە دووڕووەکانن. ئەوە نەخۆشی گومانە کە پێیەوە هاتونەتە ناو ئیسلام ﴿فَزَادَهُمُ اللَّهُ مَرَضًا﴾ ئەڵێت: پیس و چەپەڵیان زیاد دەکا[٣]. پاشان ئەم ئایەتەی خوێندەوە: ﴿فَأَمَّا الَّذِينَ آمَنُوا فَزَادَتْهُمْ إِيمَانًا وَهُمْ يَسْتَبْشِرُونَ ﴿١٢٤﴾ وَأَمَّا الَّذِينَ فِي قُلُوبِهِم مَّرَضٌ فَزَادَتْهُمْ رِجْسًا إِلَىٰ رِجْسِهِمْ ﴾[٤] جا ئەوانەی بڕوایان بە خوا هێناوە، باوەڕیان بە هێز تر دەبێ و خۆشحاڵن. ئەوانەی دڵیان نەخۆشە، پیس وناپاکیان دێتە سەر پیس وناپاکیان. ئەڵێت: خراپە دێتە سەر خراپەیان وگومڕایشیان هەر دێتە سەر یەك و زیاد دەکا. ئەمەی عەبدولڕەحان وتی قسەیەکی چاکە، چونکە پاداشتت بە پێی کردارە. زانایانی تری پێشینەش هەروایان وتووە. ئەمە وەك ئەم ئایەتە وایەکەخودای گەورە ئەفەرموێت: ﴿وَالَّذِينَ اهْتَدَوْا زَادَهُمْ هُدًى وَآتَاهُمْ تَقْوَاهُمْ ﴾[٥] ئەو کەسانەش کە هاتونەسەرڕاستەڕێ، زیاترشارەزایاندەکا، ترسی خوایان زیاتردەخاتەدڵەوە. پاشان لێرەدائەفەرموێت: ﴿بِمَا كَانُوا يَكْذِبُونَ ﴾ لەسەرئەم درۆکردنەیان وە بە ﴿يُكَذِّبُونَ﴾ یش خوێنراوەتەوە. لەسەر ئەو بێباوەڕیەیان. وەدیارە ئەوانەدرۆزن بوون و باوەڕیان بەنەدیارنەبو، واتە: درۆزنن و بێباوەڕیشن.

---

[١] الطبری /١/٢٨٠.

[٢] ابن ابی حاتم /١/٤٨.

[٣] الطبری /١/٢٨٠.

[٤] التوبة ١٢٤-١٢٥.

[٥] محمد ١٧.

**ئاگاداریەك**

قسەی ئەوانەی کە دەڵێن: پێغەمبەری خودا(ﷺ) هەندێ لە سەرەکانی دووڕووەکانی زانیوە، ئەوەیش دەگێڕنەوە بۆ فەرمودەکەی حوزەیفەی کوڕی یەمان لە ناولێنانی ئەوانە کە چواردە دووڕو بوون لە غەزای تەبووکدا کە ویستیان وشترەکەی پێغەمبەر(ﷺ) ڕاونێن پێیەوەو هەڵی دێرن و لەسەری بکەوێتە خوارەوە. خودای گەورە پێغەمبەری(ﷺ) ئاگادار کرد لەو کارەیان، پێغەبەریش(ﷺ) حوزەیفەی لێئاگادار کرد. بەڵام جگە لەوانە خودا باسی دووڕووەکانی تریشی کردووەو ئەفەرموێت: ﴿ وَمِمَّنْ حَوْلَكُم مِّنَ الْأَعْرَابِ مُنَافِقُونَ ۖ وَمِنْ أَهْلِ الْمَدِينَةِ ۖ مَرَدُوا عَلَى النِّفَاقِ لَا تَعْلَمُهُمْ ۖ نَحْنُ نَعْلَمُهُمْ ﴾[1]. لەو عەرەبە دەشتەکیانەی کە لە دەورو بەری ئێوەن هەندێکیان و هەندێکیش لە خەڵکی مەدینە دووڕون و هەر بۆ دووڕویی هاتوون، تۆ ئەوانە ناناسی. وە ئەفەرموێت: ﴿لَّئِن لَّمْ يَنتَهِ الْمُنَافِقُونَ وَالَّذِينَ فِي قُلُوبِهِم مَّرَضٌ وَالْمُرْجِفُونَ فِي الْمَدِينَةِ لَنُغْرِيَنَّكَ بِهِمْ ثُمَّ لَا يُجَاوِرُونَكَ فِيهَا إِلَّا قَلِيلًا ﴿٦٠﴾ مَّلْعُونِينَ ۖ أَيْنَمَا ثُقِفُوا أُخِذُوا وَقُتِّلُوا تَقْتِيلًا ﴾[2] خۆ ئەگەر دووڕوەکان و ئەوانەش کە لەناو دڵیاندا نەخۆشی هەیە و ئەو کەسانەی لەناو شاری مەدینەدا لە دژی ئاین شایعەو دەنگ وباس بڵاو دەکەنەوە دەس هەڵنەگرن دەیانخەینە بەردەستی تۆو لەئاکامدا جگە لە ماوەیەکی کەم لەو شارەدا ناتوانن ببنە دراوسێت. نەفرین لەوانە کراوە لەهەر کوێیەکا وەگیر کەوتن، دەگیرێن و هەر بەیەکجارەکی دەکوژرێن. ئەم ئایەتە بەڵگەیە لەسەر ئەوە کە ئەو دووڕوانە دەمێڵێتەوەو هەر بەو شێوەیە دەمێننەوە، ئەمە هەر بۆئەوەیە کە نیشانەکانیان لە بیر نەکەن و هەندێکیان ئەو سیفەتانەیان پێوە دیارەو بیان ناسن. وەك ئەفەرموێت: ﴿وَلَوْ نَشَاءُ لَأَرَيْنَاكَهُمْ فَلَعَرَفْتَهُم بِسِيمَاهُمْ ۚ وَلَتَعْرِفَنَّهُمْ فِي لَحْنِ الْقَوْلِ ﴾[3] ئەگەر حەزمان بکردایە دەمانهێنانە بەرچاوت و ئیتر هەر بەورد بوونەوە لەبیچمیان باش دەتناسین. بێگومان بە شێوازی قسە کردنیشا دەیان ناسن. وە بەناوبانگترین کەسان بە دووڕویی عەبداللەی کوڕی ئوبەی کوڕی ئەبی سەلولە. کە زەیدی کوڕی ئەرقەم شایەتی لەسەر دا. کە عومەری کوڕی خەتاب گلەیی لە پێغەمبەر کرد(ﷺ) دەربارەی، پێغەمبەریش(ﷺ) فەرمووی: من پێم ناخۆشە عەرەبەکان باسی بکەن کە موحەمەد(ﷺ) هاوەڵەکانی خۆی دەکوژێ[4]. لەگەڵ ئەویشا کاتێ کە عەبداللەی کوڕی ئوبەی مرد.

---

[1] التوبة ١٠١.

[2] الاحزاب ٦٠-٦١.

[3] محمد ٣٠.

[4] الطبری /٢٣/٤٠٦ ص٣٧.

پێغەمبەری خودا(ﷺ) ئامادەی ناشتنەکەی بوو وەك چۆن بۆ مسوڵمانەکانی تر ئامادە دەبوو. وە لە فەرمودەی سەحیحدا هاتووە: من سەرپشك كرام منیش ئەمەم هەڵبژارد[1]. وە لە ڕیوایەتێکی ترا هاتووە: ئەگەر بمزانیایە ئەگەر زیاترم بکردایە لە حەفتا جار لێی دەبوری هەر بۆم زیاد دەکرد.

﴿ وَإِذَا قِيلَ لَهُمْ لَا تُفْسِدُوا فِي الْأَرْضِ قَالُوا إِنَّمَا نَحْنُ مُصْلِحُونَ (11) أَلَا إِنَّهُمْ هُمُ الْمُفْسِدُونَ وَلَٰكِن لَّا يَشْعُرُونَ (12) ﴾

## مەبەست بە بەدفەڕی (الفساد) لەم دوو ئایەتەدا

خودای گەورە ئەفەرموێت: ﴿ وَإِذَا قِيلَ لَهُمْ لَا تُفْسِدُوا فِي الْأَرْضِ قَالُوا إِنَّمَا نَحْنُ مُصْلِحُونَ ﴾ ئەگەر کەسێ پێیان بڵێ: لەم زەویە بەدفەڕی مەکەن، دەڵێن: ئێمە چاکەکارین. سوددی ئەڵێت لە تەفسیرەکەیدا لە ئیبنو عەباسەوە لە ئیبنو مەسعودەوە لە هەندێ لە هاوەڵەکانی پێغەمبەرەوە(ﷺ):

﴿ وَإِذَا قِيلَ لَهُمْ لَا تُفْسِدُوا فِي الْأَرْضِ قَالُوا إِنَّمَا نَحْنُ مُصْلِحُونَ ﴾ئەڵێن: بەدفەڕی بریتیە لە خودا نەناسی و کار بەتاوان باری و گوناهکردن[2]. ئەبو جەعفەر ئەڵێت لە ڕەبیعی کوڕی ئەنەسەوە لە ئەبولعالیەوە لەم ئایەتەدا کە خودای گەورە ئەفەرموێت: ﴿ وَإِذَا قِيلَ لَهُمْ لَا تُفْسِدُوا فِي الْأَرْضِ ﴾ ئەگەر پێیان بڵێن: بەدفەڕی لە زەویدا مەکەن، ئەڵێن: تاوان لە زەویدا مەکەن. یان فەرمان مەدەن بە سەرپێچی کردنی فەرمانی خودا، چونکە بەدفەڕیەکەیان سەرپێچی فەرمانی خودا بوو، هەرکەسێ سەرپێچی فەرمانی خودا بکا ئەوە بەدفەڕی لە زەمیندا کردووە، چونکە چاکە کردن لە زەویی و ئاسماندا بە گوێڕایەڵی کردنی فەرمانی خودایە[3]. ڕەبیعی کوڕی ئەناس و قەتادەیش هەروایان وتووە[4].

## جۆری بەدفەڕی دووڕوەکان

ئیبنو جەریرئەڵێت: خەڵکی دووڕو بەدفەڕن لەسەر زەمینا بەهۆی تاوان و سەرپێچی کردنی پەروەردگاریان و ڕۆچونیان لەو شتانەی کە خودا لێی قەدەغە کردوون و بەردەوام بوون لە سەری و لەدەس دان و فەوتانی فەرزەکانی و گومانیان لە ئاینەی کە هیچ کردارێك وەرناگیرێ لە هیچ کەسێ مەگین بە بڕوابوون و دڵنیایی بەڕاست و ڕەوانی پێی. وە درۆ کردنیان لەگەڵ خاوەنباوەڕان بەوەی کە خۆیان بە بڕوادار لەقەڵەم ئەدەن کەچی بە پێچەوانەوە دڵیان پڕە لە گومان و دڵە ڕاوکە. وە هاوکاری کردنی ئەو خەڵکانەی کە بڕوایان بە خوداو کتێبەکانی و پێغەمبەرەکانی نیە لەسەر دژایەتی

---

[1] فتح الباری /٨/١٨٤/، مسلم/٤/٢١٤١.

[2] الطبری /١/٢٨٨ ص٣٧.

[3] إبن ابي حاتم/١/٥٠.

[4] إبن ابی حاتم /١/٥١.

کردنی دۆستانی خودا، هەرکاتێ ئەو هەلەیان وەدەست هێناو بۆیان ڕەخسا،ئەوە بەدفەڕی دووڕووەکانە لە زەویدا. کەچی ئەو کردارەی خۆیان بە چاك دەزانن لە زەویدا[1]. ئەمە ئەو قسەیە حەسەن وتی، دۆستایەتی کردنی باوەڕداران لەگەڵ خوانەناساندا لەبەدفەڕی کردنە لە زەویدا وەك خودای گەورە ئەفەرموێت: ﴿ وَٱلَّذِينَ كَفَرُواْ بَعْضُهُمْ أَوْلِيَآءُ بَعْضٍ ۚ إِلَّا تَفْعَلُوهُ تَكُن فِتْنَةٌ فِى ٱلْأَرْضِ وَفَسَادٌ كَبِيرٌ ﴾[2] بەرەی خوانەناسانیش دۆستی نزیکی یەکترین، ئەگەر ئێوە وەك من پێم وتوون ڕەفتار نەکەن، پشێویی و ئاژاوەی زۆر لەم سەرزەمینە ڕوو ئەدا. خودای گەورە دۆستایەتی لە نێوان بروادارانو خوانەناساندا بڕیوەو جیاکردۆتەوە، وەك ئەفەرموێت: ﴿يَـٰٓأَيُّهَا ٱلَّذِينَ ءَامَنُواْ لَا تَتَّخِذُواْ ٱلْكَـٰفِرِينَ أَوْلِيَآءَ مِن دُونِ ٱلْمُؤْمِنِينَ ۚ أَتُرِيدُونَ أَن تَجْعَلُواْ لِلَّهِ عَلَيْكُمْ سُلْطَـٰنًا مُّبِينًا ﴾[3] ئەی کۆمەڵی خاوەنباوەڕان! جگە لە خاوەنباوەڕان مەبنە دۆستی خوانەناسان، ئایە ئێوە دەتان هەوێ بەڵگەیەکی بەئاشکرای دژی خۆتان بدەن بە خودا. پاشان ئەفەرموێت: ﴿ إِنَّ ٱلْمُنَـٰفِقِينَ فِى ٱلدَّرْكِ ٱلْأَسْفَلِ مِنَ ٱلنَّارِ وَلَن تَجِدَ لَهُمْ نَصِيرًا ﴾[4] دیارە ئەو کەسانەی دووڕوون وان لە تاقی هەرەخواری ئاگرا. تۆ ناتوانی یارمەتی دەریان بۆ پەیدا بکەی. دیارە دووڕو کە خۆی بە مسوڵمان دادەنێ، خاوەنباوەڕان ئەوان باش ناناسن و لێیان دەگۆڕێ، ئیتر ئەو بەدفەڕی و خراپە کاریە لە لایەن ئەو دووڕووانەوە ڕوی داوەو هاتۆتە دی. چونکە ئەو دووڕووە بەو قسە ناڕاستەی خاوەنباوەڕەکەی فریوداوەو یارمەتی خوانەناسانی داوە دژی خواناسان. خۆ ئەگەر هەر لەسەر حاڵی پێشووی بوایەو بڕوای نەهێنایە خراپەو بەدفەڕیەکەی کەمتر ئەبوو. بەڵام ئەگەر بە دڵ پاکی کاری بکردایە بۆ خوداو کردارو گفتاری وەك یەك بوایە سەرکەوتوو ڕزگار دەبوو، هەر بۆیە خودای گەورە ئەفەرموێت: ﴿ وَإِذَا قِيلَ لَهُمْ لَا تُفْسِدُواْ فِى ٱلْأَرْضِ قَالُوٓاْ إِنَّمَا نَحْنُ مُصْلِحُونَ ﴾ ئەگەر کەسێ پێیان بڵێ: لەم زەویە بەدفەڕی مەکەن، دەڵێن: ئێمە چاکەکارین. واتە: دەڵێن: ئێمە دەمان هەوێ ئاشتی بەرپا بکەین لە نێوان مسوڵمانان و ئەهلی کتێبا[5]. خودای گەورەیش ئەفەرموێت: ﴿أَلَآ إِنَّهُمْ هُمُ ٱلْمُفْسِدُونَ وَلَـٰكِن لَّا يَشْعُرُونَ﴾ باش بزانن کە خراپە کار ئەوانن، بەڵام بە خۆیان نازانن. ئەوسا ئەوانە

---

[1] الطبری /١/٢٨٩ ص٣٨.

[2] الانفال ٧٣.

[3] النساء ١٤٤.

[4] النساء ١٤٥.

[5] ابن ابی حاتم/١/٥٢ ص٣٨.

بەچاك بزانن ئەوەی ئەوانە دەیکەن و دەیڵێن کارێکی چاك دەکەن. هەرئەوە خۆی خراپە کاری و بەدفەرپە بەڵام لەبەر نەفامی و بێ ئاوەزی خۆیان نازانن خراپە.

﴿وَإِذَا قِيلَ لَهُمْ ءَامِنُوا كَمَآ ءَامَنَ ٱلنَّاسُ قَالُوٓا أَنُؤْمِنُ كَمَآ ءَامَنَ ٱلسُّفَهَآءُ أَلَآ إِنَّهُمْ هُمُ ٱلسُّفَهَآءُ وَلَٰكِن لَّا يَعْلَمُونَ ﴿١٣﴾﴾

خودای گەورە ئەفەرموێت ﴿وَإِذَا قِيلَ لَهُمْ ءَامِنُوا كَمَآ ءَامَنَ ٱلنَّاسُ﴾ هەرکاتێ کەسێ پێیان بڵێ: ئێوەش وەك ئەم خەڵکە بروا بێنن، واتە: وەك ئەو خەڵکە بڕوابێنن بە خوداو بە فریشتەکان و بە کتێبەکان و پێغەمبەران و زیندوبوونەوە دوای مردن و بەهەشت و ئاگرو ئەو شتانەی کە بڕوادارانی لێ ئاگادار کراوە دەربارەیان، گوێ ڕایەڵی فەرمانی خوداو پێغەمبەرەکەی (ﷺ) بکەن و واز لەو شتانە بێنن کە قەدەغە کراوە لێتان. ﴿قَالُوٓا أَنُؤْمِنُ كَمَآ ءَامَنَ ٱلسُّفَهَآءُ﴾ دووڕوەکان دەڵێن: جا چۆن ئێمە وەك ئەو نەفامانە بڕوا بێنین؟ بەرنەفرینی خودا کەون، مەبەستیان هاوەڵەکانی پێغەمبەری خودایە(ﷺ) ڕەزای خوایان لێبێت، ئەمە قسەی ئەبولعالیە و سوددیە لە تەفسیرەکەیدا بەسەنەدی خۆی لە ئیبنو عەباس و ئیبنو مەسعودو زۆرێك لە هاوەڵەکانی پێغەمبەر(ﷺ)[1]. ربیعی کوڕی ئەنەس و عەبدولڕەحمانی کوڕی زەیدی کوڕی ئەسلەم و کەسانی تریش هەروایان وتووە[2]. ئەو دووڕوانە دەڵێن: ئایە ئێمەو ئەوانە وەك یەك بین و لەسەر ڕێبازێ بڕۆین، خۆ ئەوانە زۆر نەفامن؟ (السفها) کۆی (سفیه)ە وەك (الحکما) کۆی (حکیم)ە. (السفیه)یانی: کەم ئاوەزو خاوەن بۆچونی لاواز و کەم ئەزمون دەربارەی چاکەو خراپە. هەربۆیە خودا منداڵو ژنانی بە نەفام و کەم ئەزمون ناو هێناوە وەك ئەفەرموێت: ﴿وَلَا تُؤْتُوا ٱلسُّفَهَآءَ أَمْوَٰلَكُمُ ٱلَّتِى جَعَلَ ٱللَّهُ لَكُمْ قِيَٰمًا﴾[3] ماڵی خۆتان کە خودا کردویەتیە مایەی گوزەرانتان مەدەنە دەست کەم ئاوەزان. زۆریەنی زانایانی تەفسیر دەڵێن: ئەوانە ژنان و منداڵانن. خودای گەورە خۆی لەم شوێنانەدا وەڵامی ئەم دووڕوانە ئەداتەوە. وەك ئەفەرموێت: ﴿أَلَآ إِنَّهُمْ هُمُ ٱلسُّفَهَآءُ وَلَٰكِن لَّا يَعْلَمُونَ﴾ بابزانن کە خۆیان نەفامەکانن، بەڵام بە خۆیان نازانن. خودای گەورە جەختی لەسەر نەفامی و کەم ئاوەزی ئەوان کردووەتەوە. یانی: لەزۆر نەفامیانە کە خۆیان ناناسن چەندە گومڕاو کەم ئاوەزن. ئەم حاڵەیان زۆر خراپترە لە کوێری و دوریان لە ڕێی ڕاست.

﴿وَإِذَا لَقُوا ٱلَّذِينَ ءَامَنُوا قَالُوٓا ءَامَنَّا وَإِذَا خَلَوْا إِلَىٰ شَيَٰطِينِهِمْ قَالُوٓا إِنَّا مَعَكُمْ إِنَّمَا نَحْنُ مُسْتَهْزِءُونَ ﴿١٤﴾ ٱللَّهُ يَسْتَهْزِئُ بِهِمْ وَيَمُدُّهُمْ فِى طُغْيَٰنِهِمْ يَعْمَهُونَ ﴿١٥﴾﴾

---

[1] الطبری /١/٢٩٣ ص٣٨.

[2] الطبری /١/٢٩٤.

[3] النساء ٥.

## فێلو تەڵەكەی دووڕوان

خودای گەورە ئەفەرموێت: ﴿ وَإِذَا لَقُوا۟ ٱلَّذِينَ ءَامَنُوا۟ قَالُوٓا۟ ءَامَنَّا وَإِذَا خَلَوْا۟ إِلَىٰ شَيَـٰطِينِهِمْ ﴾ هەر كاتێ دەگەنە خاوەنباوەڕان، دەڵێن: ئێمەش وەك ئێوە خاوەنباوەڕین، هەركاتێ چونە لای شەیتانەكانی خۆیان ﴿قَالُوٓا۟ إِنَّا مَعَكُمْ ﴾دەڵێن: ئێمە لەگەڵ ئێوەین، واتە: كاتێ ئەو دووڕووانە دەڕۆنە لای باوەڕداران دەڵێن: بڕوامان هێناوە، بڕواداری و دۆستایەتی دڵپاكی خۆیان دەردەخەن بۆ مسوڵمانان بۆ فریودانیان و لەگەڵ ژیانیان و خۆپاراستن لێیان و بەدەست هێنانی ماڵ و سامان و دەسكەوت ﴿وَإِذَا خَلَوْا۟ إِلَىٰ شَيَـٰطِينِهِمْ﴾ كاتێكیش چونە لای شەیتانەكانی خۆیان و لەگەڵیان دانیشتن دەڵێن ئێمە هەر لەگەڵ ئێوەین. مەبەست بە ﴿شَيَـٰطِينِهِمْ﴾ یانی: سەركردەو گەورەكانیان لە ئاخونەكانی جولەكەو سەرەكانی بتپەرستان و دووڕووەكان.

## شەیتانی مرۆڤ و جنۆكە

ئیبنو جەریر ئەڵێت: (شیاطین) هەر شتێكە خراپی و لاساریەكەی لەڕادە بەدەر بێت، شەیاتین لە مرۆڤ و جنۆكەیشە وەك خودای گەورە ئەفەرموێت: ﴿ وَكَذَٰلِكَ جَعَلْنَا لِكُلِّ نَبِىٍّ عَدُوًّا شَيَـٰطِينَ ٱلْإِنسِ وَٱلْجِنِّ يُوحِى بَعْضُهُمْ إِلَىٰ بَعْضٍ زُخْرُفَ ٱلْقَوْلِ غُرُورًا ﴾[1] ئێمە بۆ هەر پێغەمبەرێك دوژمنێكمان لە نێوان شەیتانەكانی مرۆڤ و جنۆكە دانا، هەندێك لەوان بۆ فریودان و قسەی ڕازاوەو درۆیان بە هەندێكی تریان ڕادەگەیاند.

## مانای گاڵتەكردن (الاستهزاء)

خودای گەورە ئەفەرموێت: ﴿قَالُوٓا۟ إِنَّا مَعَكُمْ ﴾ دەڵێن: ئێمە لەگەڵ ئێوەین. مەحەمەدكوڕی ئیسحاق ڕیوایەتی كردووە لە ئیبنو عەباسەوە،یانی: ئەوەی ئێوە لەسەرین ئێمەش هەر لەسەر ئەوەین ﴿إِنَّمَا نَحْنُ مُسْتَهْزِءُونَ ﴾ ئێمە هەر گەمە بەمانە دەكەین پێیان ڕادەبوێرین[2]. زەححاك لە ئیبنو عەباسەوە ئەڵێت: ﴿إِنَّمَا نَحْنُ مُسْتَهْزِءُونَ ﴾ یانی: وتیان ئێمە هەر گاڵتە بە هاوەڵەكانی مەحەمەد (ﷺ) دەكەین[3]. ڕەبیعی كوڕی ئەنەس و قەتادەش هەروایان وتووە[4]. خودای گەورە دەربارەی ئەو كردارەیان وەڵامیان

---

[1] الانعام ١١٢.

[2] الطبری /١/٣٠٠ ص٣٩.

[3] الطبری /١/٣٠٠.

[4] الطبری /١/٣٠٠.

ئەداتەوەو ئەفەرموێت: ﴿ ٱللَّهُ يَسْتَهْزِئُ بِهِمْ وَيَمُدُّهُمْ فِي طُغْيَٰنِهِمْ يَعْمَهُونَ ﴾ خودا گاڵتە بەوان دەکاو بەریان بۆ شل دەکا، تا لە ئەو سەرو کێشەیەدا سەرگەردان ببن. ئیبنو جەریرئەڵێت: خودای گەورە هەواڵی داوە کە لە ڕۆژی قیامەتدا تۆڵەیان لێدەستێنێ لەسەر ئەو کردەوەیان وەك دەفەرموێت: ﴿ يَوْمَ يَقُولُ ٱلْمُنَٰفِقُونَ وَٱلْمُنَٰفِقَٰتُ لِلَّذِينَ ءَامَنُوا۟ ٱنظُرُونَا نَقْتَبِسْ مِن نُّورِكُمْ قِيلَ ٱرْجِعُوا۟ وَرَآءَكُمْ فَٱلْتَمِسُوا۟ نُورًا فَضُرِبَ بَيْنَهُم بِسُورٍ لَّهُۥ بَابٌۢ بَاطِنُهُۥ فِيهِ ٱلرَّحْمَةُ وَظَٰهِرُهُۥ مِن قِبَلِهِ ٱلْعَذَابُ [1] ﴾ ئەو ڕۆژە دووڕووەکان پیاو و ژن بە خاوەنباوەڕان دەڵێن: ئێوە لامان لێبکەنەوە، تا تروسکێك لە ڕوناکیتان وەرگرین، پێیان دەڵێن: بەرەو دواوەی خۆتان وەرگەڕێن، لەوێ ڕوناکی پەیدا دەکەن، ئیتر ئەوسا دیوارێکیان لە نێوان دەبێتە لەمپەر، دەرگای هەیە لە ناوەوەی بەزەیی و لە دەرەوەی سزایە. وە ئەفەرموێت: ﴿ وَلَا يَحْسَبَنَّ ٱلَّذِينَ كَفَرُوٓا۟ أَنَّمَا نُمْلِي لَهُمْ خَيْرٌ لِّأَنفُسِهِمْ ۚ إِنَّمَا نُمْلِي لَهُمْ لِيَزْدَادُوٓا۟ إِثْمًا ﴾[2] با ئەوانەی خوا نەناسن وا بیر نەکەن ئەو مۆڵەتەی دەیان دەینێ چاکە بۆیان، هەر بۆیە مۆڵەتیان ئەدەین تا تاوانیان زۆرتر بێت، ئازارێکی ئابڕوبەریش بەشیان دەبێ. ئەمە لەو گاڵتە کردنە دەچێ کە خودا باسی کردووە کە دەیکات بە دووڕووەکان و ئەوانەی کە شەریکیان بۆ داناوە.

### فرۆفێڵی دووڕوەکان و ئاکامەکەی لەسەر خۆیان

ئەمە ئاگاداریەکە لەلایەن خوداوە لە بری ئەو گاڵتە کردنەیاندا سزایان ئەدا، تۆڵەی ئەو فریودان و فرۆفێڵەیان لێ دەسێنێ، هەواڵی پاداشت دانەوەو تۆڵە لێکردنەوەکەیانی لەسەر ئەو کارانەیان بەو شێوەیە هێناوە کە شایستەینی، وەك ئەفەرموێت: ﴿ ٱللَّهُ يَسْتَهْزِئُ بِهِمْ ﴾ خودایش گاڵتە بەوان دەکا. وتەکە یەك وتەیە بەڵام ماناکان جیاوازن. وەك خودای گەورە ئەفەرموێت: ﴿ وَجَزَٰٓؤُا۟ سَيِّئَةٍ سَيِّئَةٌ مِّثْلُهَا ۖ فَمَنْ عَفَا وَأَصْلَحَ فَأَجْرُهُۥ عَلَى ٱللَّهِ ﴾[3] سزا بۆ هەر خراپەیەك خراپەیەکی وەك ئەوە. کێش لە تۆڵە چاوپۆشی و کۆشش بۆ ئاشتی بکا، پاداشتی لەسەر خودایە. وە ئەفەرموێت: ﴿ فَمَنِ ٱعْتَدَىٰ عَلَيْكُمْ فَٱعْتَدُوا۟ عَلَيْهِ ﴾[4] سا هەرکەسێ دەستدرێژی لە ئێوە کرد،ئێوەش هەر بەئەندازەی ئەو دەس درێژی بکەنەوە سەری. جاری یەکەم ناهەقیە بەڵام جاری دووەم دادگەریە. هەرچەندە وتەکان وەك یەکن بەڵام ماناکانیان جیاوازە. ئیبنو جەریر ئەڵێت: هەرچی لە قورئاندا هاتووە ئەم مانایە. چونکە فێڵ و تەڵەکە و گاڵتە

---

[1] الحديد ١٣.

[2] ال عمران ١٧٨.

[3] الشورا ٤٠.

[4] البقرة ١٩٤.

کردن بە شێوەی گەمە کردن دوورە لە خودای گەورەوە بە کۆدەنگی زانایان. بەڵام بە شێوەی تۆڵە لێکردنەوە و ڕووبەڕوو بونەوە بە دادپەروەری و تۆڵە لێسەندن هیچی تێدا نیەو دروستە.

### بەربۆشل کردن و سەرکێشی و سەرگەردانی

خودای گەورە ئەفەرموێت: ﴿وَيَمُدُّهُمْ فِي طُغْيَانِهِمْ يَعْمَهُونَ﴾ بەریان بۆ شل دەکا، تا لەو سەرکێشیەدا سەرگەردان بن. سودی ڕیوایەتی کردووە لە ئیبنو عەباس و ئیبنو مەسعودو چەند کەسێ لە هاوەڵەکانی پێغەمبەرەوە(ﷺ) کەوتویانە: بەریان بۆ شل دەکا[1]. موجاهید ئەڵێت: بۆیان زیاد دەکا[2].

خودای گەورە ئەفەرموێت: ﴿أَيَحْسَبُونَ أَنَّمَا نُمِدُّهُم بِهِ مِن مَّالٍ وَبَنِينَ ۝ نُسَارِعُ لَهُمْ فِي الْخَيْرَاتِ بَل لَّا يَشْعُرُونَ﴾[3] ئایا ئەوان وا دەزانن ئێمە بە ماڵ و کوڕان یارمەتیان ئەدەین، هەر بۆ ئەوەیە پەلەمانە لە چاکە کردن لە گەڵیان؟ نەخەیەر ئەمانە نەزانن. ئیبنو جەریر ئەڵێت: ڕاستیەکەی ئەوەیە یارمەتیان ئەدەین و دەستیان بۆ شل دەکەین و وازیان لێدێنین تا بەردەوام بن لە سەرگەردانی و لاساریان. وەك خودای گەورە ئەفەرموێت: ﴿وَنُقَلِّبُ أَفْئِدَتَهُمْ وَأَبْصَارَهُمْ كَمَا لَمْ يُؤْمِنُوا بِهِ أَوَّلَ مَرَّةٍ وَنَذَرُهُمْ فِي طُغْيَانِهِمْ يَعْمَهُونَ﴾[4] هەروا ئەوان جاری یەکەم باوەڕیان بە قورئان نەکرد ئێمەش دڵ و دیدەی ئەوان لە کار دەخەین، هەر وەك هەن وازیان لێدێنین کە هەر بەنافەرمانیەوە سەرگەردان بن. (الطغیان) بریتیە لە دەرچون لە شتێك وەك خودای گەورە ئەفەرموێت: ﴿إِنَّا لَمَّا طَغَا الْمَاءُ حَمَلْنَاكُمْ فِي الْجَارِيَةِ﴾[5] ئێمە کاتێ لافاو هات و بواری بڕی لە کەشتیدا کەبەسەر ئاودا دەگەڕێ هەڵمان گرتن. ئیبنو جەریر ئەڵێت: (العمه) یانی: گومڕایی.

وەئەڵێت: ﴿فِي طُغْيَانِهِمْ يَعْمَهُونَ﴾ یانی: لە گومڕایی و ئەو بێبڕوایانەدا کە پێستەکەی داپۆشیون و چەپەڵیەکەی بەسەریانەوەیە دێن و دەچن و سەرگەردان و گومڕان و هیچ ڕێگایەکیان دەستناکەوێ لێیەوە دەرباز بن چاوەکانیان کوێرە تا بەرەو ڕێی ڕاست بڕۆن و پەردەی بەسەرا دراوە ڕێگە دەرناکەن و شارەزای ڕێگەیش نابن[6].

﴿أُولَٰئِكَ الَّذِينَ اشْتَرَوُا الضَّلَالَةَ بِالْهُدَىٰ فَمَا رَبِحَت تِّجَارَتُهُمْ وَمَا كَانُوا مُهْتَدِينَ ۝١٦﴾

---

[1] الطبری ص٣٩.

[2] ابن ابی حاتم /١/٥٧.

[3] المؤمنون ٥٥-٥٦.

[4] الانعام ١١٠. الطبری /١/٣٠٧ ص٣٩.

[5] الحاقة ١١.

[6] الطبری /١/٣٠٩.

خودای گەورە ئەفەرموێت: ﴿ أُوْلَٰٓئِكَ ٱلَّذِينَ ٱشۡتَرَوُاْ ٱلضَّلَٰلَةَ بِٱلۡهُدَىٰ ﴾ ئەوانە ڕاستە ڕێیان گۆڕی بە گومڕایی و لە بازرگانیەکەیاندا تێشکاو و ڕێگای ڕاستیان بەدی نەکرد. سودی ڕیوایەتی کردووە لە تەفسیرەکەیدا لە ئیبنو عەباس و ئیبنو مەسعودو چەندین کەس لە هاوەڵەکانی پێغەمبەرەوە (ﷺ) لەم ئایەتەدا کە خودای گەورە ئەفەرموێت: ﴿ أُوْلَٰٓئِكَ ٱلَّذِينَ ٱشۡتَرَوُاْ ٱلضَّلَٰلَةَ بِٱلۡهُدَىٰ ﴾ ئەوانە ڕاستە ڕێیان گۆڕی بە گومڕایی. ئەڵێن: گومڕاییان گرتە بەرو وازیان لە ڕاستە ڕێ هێنا، موجاهید ئەڵێت: باوەڕیان هێنا و بوونەوە خوانەناس. قەتادە ئەڵێت: گومڕاییان لەلا چاکتر بوو لە ڕێی ڕاست، ئەمەی قەتادە دەیڵێت لە مانادا لەم ئایەتە دەچێت کە خودای گەورە ئەفەرموێت: ﴿وَأَمَّا ثَمُودُ فَهَدَيۡنَٰهُمۡ فَٱسۡتَحَبُّواْ ٱلۡعَمَىٰ عَلَى ٱلۡهُدَىٰ ﴾[1] ئێمە ڕێگەی بەرەو خۆمان نیشانی هۆزی سەموودیش دا لەباتی شارەزا بوون حەزیان کرد هەر نابینا بن. کورتەی قسەی خاوەن تەفسیرەکەمان کە لە پێشەوە باسیان لێکرد ئەوەیە کە دووڕووەکان لە ڕێی ڕاست لایان داو بەرەو گومڕایی چوون، ڕێی ڕاستیان گۆڕیەوە بە گومڕایی ئەمەش مانای ئەم ئایەتەیە کە ئەفەرموێت: ﴿ أُوْلَٰٓئِكَ ٱلَّذِينَ ٱشۡتَرَوُاْ ٱلضَّلَٰلَةَ بِٱلۡهُدَىٰ ﴾ ئەوانە ڕاستە ڕێیان دا بە گومڕایی پێیان گۆڕیەوە ئەو دووڕوانە هیچ جیاوازیەکیان نیە، چ ئەوانەی کە بڕوای هێنا و پاشان گەڕایەوە بۆ سەر خوانەناسی و چ ئەوانەشی هەر بە دووڕوویی مانەوە, وەك خودای گەورە دەربارەیان ئەفەرموێت: ﴿ ذَٰلِكَ بِأَنَّهُمۡ ءَامَنُواْ ثُمَّ كَفَرُواْ فَطُبِعَ عَلَىٰ قُلُوبِهِمۡ﴾[2] چونکە ئەمان لە پێشا باوەڕیان هێناوەو پاشان لە ئاین لایان داوە، جا سەر دڵیان مۆر کراوە. یان: حەزیان لە گومڕایی کرد لەباتی ڕێی ڕاست وەك کۆمەڵێکی تریان وایان کرد، چونکە ئەم دووڕوانە هەمە جۆر و هەمە چەشنن هەر بۆیە خودای گەورە ئەفەرموێت: ﴿فَمَا رَبِحَت تِّجَٰرَتُهُمۡ وَمَا كَانُواْ مُهۡتَدِينَ ﴾جا نە بازرگانیەکەیان قازانجی کردوو و نە ڕێگەی ڕاستیان گرت. ئیبنو جەریر ڕیوایەتی کردووە لە قەتادەوە﴿فَمَا رَبِحَت تِّجَٰرَتُهُمۡ وَمَا كَانُواْ مُهۡتَدِينَ ﴾ ئەڵێت: سوێند بە خودا! بە چاوی خۆتان دیتان لە ڕێی ڕاست دەرچوون بەرەو گومڕایی و لەناو کۆمەڵەوە بۆ جیابونەوە و لە دڵیانەوە بۆ ترس و لە سونەتەوە بۆ بیدعە[3]. ئیبنو ئەبی حاتەمیش هەر بەم جۆرە ڕیوایەتی کردوە[4].

---

[1] فصلت ١٧.

[2] المنافقون ٣.

[3] الطبری /١/٣١٦.

[4] ابن ابی حاتم /١/٦٠.

﴿مَثَلُهُمۡ كَمَثَلِ ٱلَّذِي ٱسۡتَوۡقَدَ نَارٗا فَلَمَّآ أَضَآءَتۡ مَا حَوۡلَهُۥ ذَهَبَ ٱللَّهُ بِنُورِهِمۡ وَتَرَكَهُمۡ فِي ظُلُمَٰتٖ لَّا يُبۡصِرُونَ ١٧ صُمُّۢ بُكۡمٌ عُمۡيٞ فَهُمۡ لَا يَرۡجِعُونَ ١٨﴾

### وێنەی دووڕووەکان

﴿مَثَلُهُمۡ كَمَثَلِ ٱلَّذِي ٱسۡتَوۡقَدَ نَارٗا فَلَمَّآ أَضَآءَتۡ مَا حَوۡلَهُۥ ذَهَبَ ٱللَّهُ بِنُورِهِمۡ وَتَرَكَهُمۡ فِي ظُلُمَٰتٖ لَّا يُبۡصِرُونَ ١٧ صُمُّۢ بُكۡمٌ عُمۡيٞ فَهُمۡ لَا يَرۡجِعُونَ﴾ ئەمانە وێنەیان بە وێنەی کەسانی چوون، کە خەریکی هەڵگیرسانی ئاگرێك بوون،هەر کە ڕۆشنایی ئاگر دەورو بەری ڕۆشن کردن، خودا ڕووناکیەکەی بردن و لە تاریکیەکی وادا وێڵی کردن کە هیچ نەبینن. کەڕ و لاڵ و کوێرن، ناشتوانن بشگەڕێنەوە. خودای گەورە ئەم نمونەی هێنا وەتەوە بۆ ئەمانە کە ڕێگەی ڕاستیان گۆڕیوەتەوە بە گومرایی و شارەزا بوون و بەرەو سەرگەردانی گەڕانەوە. وەك کەسێك ئاگرێکی هەڵگیرساندبێ، کاتێ کە چواردەوری خۆی ڕوناك دەکاتەوە و کە سوودی لێوەرگرێ و ئەولا و لای خۆی ببینێ و لەبەری دانیشێ ئالەو کاتەدا ئاگرەکە بکوژێتەوە و ببێت بە تاریکستان و هیچ شتێ نەبینێ و نەزانێ و بەرە و کوێ بڕوات. لەگەڵ ئەوەشدا کەڕو و کوێرو لاڵیش بێ. نە ببیسێ و نەقسەش بکا، کوێریشە خۆ ئەگەر ڕووناکیش هەبوایە عیچ سودی نەدەبوو بۆی و نەی دەتوانی بگەڕێتەوە بۆ ئەو شوێنەی کە لێیەوە هاتووە لە پێشا، ئەم دووڕوانەش هەر وەك ئەوان وان، کە ڕێگەی ڕاستیان گۆڕیەوە بە گومرایی، سەرگەردانیان لا خۆشتر بوو لە ڕاستە ڕێ، ئەم نمونەیە ئەوە دەگەیەنێ کە ئەوانە باوەڕیان هێنا پاشان پەشیمان بوونەوە. وەك خودای گەورە لە شوێنی ترا لە قورئاندا باسی کردوون و الله أعلم. پاشان ئەفەرموێت: ﴿ذَهَبَ ٱللَّهُ بِنُورِهِمۡ﴾ خودا ڕوناکمیەکەی لێکوژاندنەوە، کە سودی لێوەرگرن، تەنیا ئەوەی بۆ هێلانەوە کە دووکەڵ و سوتاندنەکەیە ﴿وَتَرَكَهُمۡ فِي ظُلُمَٰتٖ لَّا يُبۡصِرُونَ﴾ لە تاریکیەکی وادا وێڵی کردن کە هیچ نەبینن. واتە: لە گومان و خوانەناسی و دووڕوییدا سەرگەردانی کردن و ڕێگەی ڕاستیان بۆ نەئەدۆزرایەوە، لەگەڵ ئەوەیشا چاکەیان نەدەبیست و قسەیەکیشیان نەدەکرد کەڵکی بوێ بۆیان. لە گومرایەکی وایشا بوون سەرگەردانی کردبوون وەك خودای گەورە لە ئایەتێکی ترا ئەفەرموێت: ﴿فَإِنَّهَا لَا تَعۡمَى ٱلۡأَبۡصَٰرُ وَلَٰكِن تَعۡمَى ٱلۡقُلُوبُ ٱلَّتِي فِي ٱلصُّدُورِ﴾[1] لە ڕاستیدا چاو کوێر نابن، ئەو دڵانە کوێر دەبن کە جێیان لە ناو سنگەکانە. هەر بۆیە جارێکی تر ناگەڕێنەوە بۆ ئەو ڕێگە ڕاستەی کە لەسەری بوون کە فرۆشتیان و گۆڕیانەوە بەو گومراییە.

---

[1] الحج ٤٦.

﴿ أَوْ كَصَيِّبٍ مِّنَ ٱلسَّمَآءِ فِيهِ ظُلُمَٰتٌ وَرَعْدٌ وَبَرْقٌ يَجْعَلُونَ أَصَٰبِعَهُمْ فِىٓ ءَاذَانِهِم مِّنَ ٱلصَّوَٰعِقِ حَذَرَ ٱلْمَوْتِ ۚ وَٱللَّهُ مُحِيطٌۢ بِٱلْكَٰفِرِينَ ﴿١٩﴾ يَكَادُ ٱلْبَرْقُ يَخْطَفُ أَبْصَٰرَهُمْ ۖ كُلَّمَآ أَضَآءَ لَهُم مَّشَوْا۟ فِيهِ وَإِذَآ أَظْلَمَ عَلَيْهِمْ قَامُوا۟ ۚ وَلَوْ شَآءَ ٱللَّهُ لَذَهَبَ بِسَمْعِهِمْ وَأَبْصَٰرِهِمْ ۚ إِنَّ ٱللَّهَ عَلَىٰ كُلِّ شَىْءٍ قَدِيرٌ ﴿٢٠﴾ ﴾

## نمونەیەکی تر بۆ دووڕووەکان

خودای گەورە ئەفەرمویێت: ﴿ أَوْ كَصَيِّبٍ مِّنَ ٱلسَّمَآءِ فِيهِ ظُلُمَٰتٌ وَرَعْدٌ وَبَرْقٌ يَجْعَلُونَ أَصَٰبِعَهُمْ فِىٓ ءَاذَانِهِم مِّنَ ٱلصَّوَٰعِقِ حَذَرَ ٱلْمَوْتِ ۚ وَٱللَّهُ مُحِيطٌۢ بِٱلْكَٰفِرِينَ ﴿١٩﴾ يَكَادُ ٱلْبَرْقُ يَخْطَفُ أَبْصَٰرَهُمْ ۖ كُلَّمَآ أَضَآءَ لَهُم مَّشَوْا۟ فِيهِ وَإِذَآ أَظْلَمَ عَلَيْهِمْ قَامُوا۟ ۚ وَلَوْ شَآءَ ٱللَّهُ لَذَهَبَ بِسَمْعِهِمْ وَأَبْصَٰرِهِمْ ۚ إِنَّ ٱللَّهَ عَلَىٰ كُلِّ شَىْءٍ قَدِيرٌ ﴾ یانی: هەروەك کەسانیٚ کە بارانی بە تەوژمیان لەگەڵ هەورو چەخماخە دان لەو ئاسمانەوە بۆ بباریٚ و بکەونە ناو تاریکی، لە ترسی هەورە تریشقە پەنجەیان بخەنە ناو گوێیان، نەکا بمرن خودا دەوری لەم خوانەناسان داوە. ئەمە نمونەیەکی ترە خودای مەزن هێناویەتیەوە بۆ دەستەیەکی تر لە دووڕووەکان. ئەو کەسانەی جاریٚ هەقیان بۆ دەردەکەویٚ و جارێکی تر دیسان دەکەونەوە گومان، دڵیان لە کاتی ئەو گومان و خوانەناسی و دڵە ڕاوکێیەدا وەك تەوژمی باران وایە. ئەمە قسەی ئیبنو مەسعودو ئیبنو عەباس و هەندیٚ لە هاوەڵەکانی پێغەمبەرە(ﷺ)[1]. ئەبولعایەو موجاهید و سەعیدی کوڕی جوبەیر و عەتا و حەسەنی بەسرین و قەتادە و عەتیەی عەوفی و عەتای خۆراسانی و سوددی و ڕەبیعی کوڕی ئەنەسیش هەر وایان وتووە[2]. زەححاك ئەڵێت: (كصيب)یانی: وەك هەور[3]. بەڵام مەشهور تر ئەو بارانەیە کە لە ئاسمانەوە دێتە خوارەوە لە کاتی تاریکیدا، کە بریتیە لە گومان و خوا نەناسی و دووڕوویی (رعد) یانی: چەخماغە. ئەو ترسەی دڵ هەراسان دەکا، چونکە حاڵی دووڕوو هەمیشە دڵە ڕاوکەو ترس و لەرزە. وەك خودای گەورە ئەفەرموێت: ﴿يَحْسَبُونَ كُلَّ صَيْحَةٍ عَلَيْهِمْ﴾[4] هەموو هەراو قیرەیەك لە دژی خۆیان دەزانن. وە ئەفەرموێت: ﴿وَيَحْلِفُونَ بِٱللَّهِ إِنَّهُمْ لَمِنكُمْ وَمَا هُم مِّنكُمْ وَلَٰكِنَّهُمْ قَوْمٌ يَفْرَقُونَ ﴿٥٦﴾ لَوْ يَجِدُونَ مَلْجَـًٔا أَوْ مَغَٰرَٰتٍ أَوْ مُدَّخَلًا لَّوَلَّوْا۟ إِلَيْهِ وَهُمْ يَجْمَحُونَ ﴾[5] بە سوێندەوە ڕوش دەبنەوە، دەڵێن: ئێمەش لە خۆتانین، درۆش دەکەن لە ئێوە نین. بەڵام ئەوان کۆمەڵێکی

---

[1] الطبری /١/٣٣٤ ص٤٠.

[2] ابن ابی حاتم /١/٦٦.

[3] ابن ابی حاتم /١/٦٧.

[4] المنافقون ٤.

[5] التوبة ٥٦-٥٧.

ترسنۆکەن. ئەگەر پەنایەك یان ئەشکەوتێ یان کون و قوژبنێکیان دەس کەوێ، بە هەڵە داوان بۆی دەچوون. (البرق) ئەو ڕووناکیەیە کە ئەدات لە دڵی ئەو کۆمەڵە دووڕوە لە هەندێ کاتدا. هەر بۆیە خودای گەورە ئەفەرموێت: ﴿يَجْعَلُونَ أَصَٰبِعَهُمْ فِىٓ ءَاذَانِهِم مِّنَ ٱلصَّوَٰعِقِ حَذَرَ ٱلْمَوْتِ ۚ وَٱللَّهُ مُحِيطٌۢ بِٱلْكَٰفِرِينَ﴾ لەترسی هەورە تریشقە پەنجەکانیان دەخەنە ناو گوێیان،نەکا بمرن. خودا دەورەی لەم خوانەناسانە داوە. واتە: ئەو ترس و لەرزە هیچ دادێکیان نادا،چونکە ئەوانە لە ژێر دەسەلات و توانای خودان و لێی دەرناچن. وەك ئەفەرموێت: ﴿هَلْ أَتَىٰكَ حَدِيثُ ٱلْجُنُودِ ﴿١٧﴾ فِرْعَوْنَ وَثَمُودَ ﴿١٨﴾ بَلِ ٱلَّذِينَ كَفَرُوا۟ فِى تَكْذِيبٍ ﴿١٩﴾ وَٱللَّهُ مِن وَرَآئِهِم مُّحِيطٌۢ﴾[1] ئایا تۆ باسی هەواڵی شەرکەرەکانت پێگەیشت؟ لەشکرەکانی فیرعەون و هۆزی سەموود؟ دیارە ئەوانەی خوانەناسن هەر لەمانە حاشا دەکەن. خواش لای پشتیانەوە دەوری داون. پاشان خودای گەورەئەفەرموێت: ﴿ يَكَادُ ٱلْبَرْقُ يَخْطَفُ أَبْصَٰرَهُمْ﴾ لەوانیە بروسکەی هەور کوێریان بکا. لەبەر توندی و بە هێزی خۆیی و کزی چاوەکانیان و خۆڕانەگرتنیان لەسەر باوەڕهێنان. عەلی کوڕی ئەبو تەلحە لە ئیبنو عەباسەوە: ﴿ يَكَادُ ٱلْبَرْقُ يَخْطَفُ أَبْصَٰرَهُمْ﴾ لەوانەیە بروسکەی هەور کوێریان بکا. واتە: لەوانەیە ئایەتە پتەوەکانی قورئان ڕێنمایی بدا بۆ عەیب و عارەکانی دووڕوەکان[2]. دیسان عەلی کوڕی ئەبو تەلحە لە ئیبنو عەباسەوە: ﴿كُلَّمَآ أَضَآءَ لَهُم مَّشَوْا۟ فِيهِ﴾ هەر شریخەی چەخماغە هات دەکەونە ڕێ. ئەڵێت: هەرکاتێ دووڕوەکان سەرکەوتنی ئیسلامیان بینی، دڵیان پێی ئارام دەبێ، بەڵام کاتێ کە مسوڵمانان تووشی شکستێ هاتن، هەڵدەستن و دەیان هەوێ بەرەو خوانەناسی بچنەوە[3]. وەك خودای گەورە ئەفەرموێت: ﴿وَمِنَ ٱلنَّاسِ مَن يَعْبُدُ ٱللَّهَ عَلَىٰ حَرْفٍ ۖ فَإِنْ أَصَابَهُۥ خَيْرٌ ٱطْمَأَنَّ بِهِۦ﴾[4] هەر لەم خەڵکەدا هی وا هەیە بە دوو دڵی خوا پەرستە. ئەگەر چاکەیەکی تووش هات، بەوە لە خودا دڵنیایە. مەحەمەدی کوڕی ئیسحاق ڕیوایەتی کردووە لە ئیبنو عەباسەوە﴿كُلَّمَآ أَضَآءَ لَهُم مَّشَوْا۟ فِيهِ وَإِذَآ أَظْلَمَ عَلَيْهِمْ قَامُوا۟﴾ هەر شریخەی چەخماغە هات دەکەونە ڕێ و هەرکاتێ تاریکاییان لێداهات ڕادەوەستن. واتە: هەق دەزانن و قسەیشی پێدەکەن بە دڵیش دەڵێن لەسەر ڕاستە ڕێین. کاتێ کە دەگەڕێنەوە بەرەو خوانەناسی سەرگەردانن[5]. ئەبولعالیە و حەسەنی بەسری و قەتادە و ڕەبیعی کوڕی ئەنەس سوددی

---

[1] البروج ١٧–٢٠.

[2] الطبری /١/٣٤٩ ص٤١.

[3] الطبری /١/٣٤٩.

[4] الحج ١١.

[5] الطبری /١/٣٤٦.

هەر بەو جۆرەیان وتووە لە هاوەڵەکانی پێغەمبەرەوە(ﷺ) ئەمە زۆر ڕاست و ئاشکرا ترە و الله أعلم .
هەر بەو شێوەیەش لە ڕۆژی قیامەتا کاتێ کە خەڵکی ڕوناکیان پێئەدرێت، هەرکەسەو بە پێی پێوای خۆیان، هی وا هەیە ئەوەندە ڕوناکی پێئەدرێ کە دەوری خۆی چەند فرسەخێك یان زیاتر لەوە ڕووناك دەکاتەوە یان کەمتر لەوە. هی واش هەیە کە ڕوناکیەکەی دەکوژێتەوەو جارێکی تر ڕووناك دەبێتەوە. ماوەیەك لەسەر ڕێگە دەڕواو پاشان دەوەستێ. هی واش هەیە هەر ڕووناکیەکەی بە تەواوی دەکوژێتەوە، ئەوانە دووڕوی تەواون و خودای گەورەدەربارەیان دەفەرموێت: ﴿يَوْمَ يَقُولُ ٱلْمُنَٰفِقُونَ وَٱلْمُنَٰفِقَٰتُ لِلَّذِينَ ءَامَنُوا۟ ٱنظُرُونَا نَقْتَبِسْ مِن نُّورِكُمْ قِيلَ ٱرْجِعُوا۟ وَرَآءَكُمْ فَٱلْتَمِسُوا۟ نُورًا﴾[2] ئەو ڕۆژە دووڕووەکانی پیاوونن بە خاوەنباوەڕان دەڵێن: ئێوە لامان لێبکەنەوە تا تروسکەیەك لە ڕووناکیتان وەرگرین. پێیان دەڵێن: بەرەو دوای خۆتان وەرگەڕێن، لەوێ ڕوناکی پەیدا دەکەن. وە دەربارەی خاوەنباوەڕانیش ئەفەرموێت: ﴿يَوْمَ تَرَى ٱلْمُؤْمِنِينَ وَٱلْمُؤْمِنَٰتِ يَسْعَىٰ نُورُهُم بَيْنَ أَيْدِيهِمْ وَبِأَيْمَٰنِهِم بُشْرَىٰكُمُ ٱلْيَوْمَ جَنَّٰتٌ تَجْرِى مِن تَحْتِهَا ٱلْأَنْهَٰرُ﴾[3] ڕۆژێ دێ کە تۆ دەبینی پیاوو ژنی خاوەنباوەڕ تیشك دانەوەی کردەیان پێشکەوتووەو لەلای ڕاستیانەوە دەڕوا، خۆشی لەخۆتان ئەمڕۆ دەچنە ناو باغێکەوە جۆباریان بە بەرا دەڕوا. وە ئەفەرموێت: ﴿يَوْمَ لَا يُخْزِى ٱللَّهُ ٱلنَّبِىَّ وَٱلَّذِينَ ءَامَنُوا۟ مَعَهُۥ ۖ نُورُهُمْ يَسْعَىٰ بَيْنَ أَيْدِيهِمْ وَبِأَيْمَٰنِهِمْ يَقُولُونَ رَبَّنَآ أَتْمِمْ لَنَا نُورَنَا وَٱغْفِرْ لَنَآ ۖ إِنَّكَ عَلَىٰ كُلِّ شَىْءٍ قَدِيرٌ﴾[4] لەو ڕۆژەدا خواد پێغەمبەرو ئەوانەی لەگەڵ ئەو باوەڕیان هێناوە سووك و هەناسە سارد ناکاو تیشکی ئەوان لە پێشیان و لەلای ڕاستیانەوە هەمیشە لە جوڵە و بزوێندایە و دەڵێن: ئەی پەروەردگارمان تیشکەکەمان بۆ زیاتر کەو لێمان خۆش بە، خۆت توانات بەسەر هەموو شتێکا هەیە.

**باسی ئەو فەرمودانەی لەو بارەیەوە هاتووە**

ئیبنو ئەبی حاتەم ڕیوایەتی کردووە لە عەبدوڵلای کوڕی مەسعودەوە ﴿نُورُهُمْ يَسْعَىٰ بَيْنَ أَيْدِيهِمْ﴾ ڕووناکیەکەیان لە پێشیانەوە دەڕوات. وتی: ئەو کەسانە بە پێی ئاکارەکانیان بەسەر ڕێگەکەدا تێدەپەڕن و دەڕۆن. هی وایان هەیە ڕوناکیەکەیان بە وێنەی کێوێکە، هی واشیان هەیە نورەکەیان بە ئەندازەی دارخورمایەکە کەمترین ڕوناکیان بە ئەندازەی پەنجە گەورەیە دەکوژێتەوەو

---

[1] ابن ابی حاتم ١/٧٥.
[2] الحدید ١٣.
[3] الحدید ١٢.
[4] التحریم ٨.

دادەگیرسێتەوە[1]. وە ئیبنو ئەبی حاتەم دیسان ڕیوایەتی کردووە لە ئیبنو عەباسەوەئەڵێت: هیچ کەسێ نیە لە ئەهلی یەکتاپەرستی بێت مەگیت لە ڕۆژی قیامەتا ڕوناکیەکی پێئەدرێت، بەلاّم دووڕوو ڕوناکیەکەی ئەکوژێتەوە. خاوەنباوەڕ ترسی لێدەنیشێ کاتێ کی دەبینێ ڕوناکی دووڕوەکان دەکوژێتەوە، بۆیە دەڵێن: ﴿رَبَّنَآ أَتۡمِمۡ لَنَا نُورَنَا﴾[2] ئەی پەروەردگارمان! تیشکەکەمان بۆ زیاترکە. زەحاك ئەڵێت: ئەوەی لە دنیادا بڕوای خۆی ئاشکرا کردووە، ڕووناکیەکی لە ڕۆژی قیامەتا پێئەدرێت. کاتێ کە گەیشتە سەر پردەکە ڕووناکی دووڕوەکان دەکوژێتەوە. کاتێ کە خاوەنباوەڕەکان ئەوەیان بینی دەترسن و دەڵێن: ﴿رَبَّنَآ أَتۡمِمۡ لَنَا نُورَنَا﴾پەروەردگارمان! ڕووناکیەکەمان بۆ زیا بکە.

**بەشەکانی خاوەن باوەڕان و بەشەکانی خوانەناسان و دووڕوەکان**

ئەگەر بەم شێوەیە بێت ئەو خەڵکە دەکرێت بە چەند بەشێکەوە. خاوەنباوەڕی پاڵفتە. ئەوانەن کە لە چوار ئایەتی سەرەتای سوورەتی بەقەرەدا وەسف کران. خوانەناسی ڕووت ئەوانەن کە لە دوو ئایەتی دوای ئەوان باس کران. دووڕوەکانیش دوو بەشن. دووڕوی تەواو، ئەوانەن کە وێنەیان بە وێنە ئاگرینەکە هێنرایەوە، وە دووڕوی دوو دڵی ڕاڕا جاری وا هەیە پرشەی باوەڕیان تیا دەردەکەوێ و جاری واش هەیە دەکوژێتەوە. ئەمانەیش ئەوانەن وێنەی ئاویان بۆ هێنرایەوە، ئەمانە حاڵیان لەوانەی پێش خۆیان باشترە. پاشان خودای گەورە وێنەی ئەو بەندانەی هێناوەتەوە کە خوانەناسن و خۆیان خەریکی شتێکن، بەلاّم لەسەر هیچ شتێك نین، ئەوانەن کە جەهلی مورەکەبیان هەیە وەك خودای گەورە ئەفەرموێت: ﴿وَٱلَّذِينَ كَفَرُوٓاْ أَعۡمَٰلُهُمۡ كَسَرَابِۭ بِقِيعَةٖ يَحۡسَبُهُ ٱلظَّمۡـَٔانُ مَآءً حَتَّىٰٓ إِذَا جَآءَهُۥ لَمۡ يَجِدۡهُ شَيۡـٔٗا﴾[3] ئەوانەی خوانەناس بوون، کردەوەیان وەك ئەو تەراویلکە وایە کە لە بیاباندا هەیە، تینو وادەزانێ ئاوە کە دەیگاتێ، ئەوسا دەزانێ هیچ نیە، پاشان نموونەی ئەو خوانەناسە نەفامانە دێنێتەوە کە جەهلی بەسیتیان هەیە. ئەوانەی کە خودای گەورەدەربارەیان ئەفەرموێت: ﴿أَوۡ كَظُلُمَٰتٖ فِي بَحۡرٖ لُّجِّيّٖ يَغۡشَىٰهُ مَوۡجٞ مِّن فَوۡقِهِۦ مَوۡجٞ مِّن فَوۡقِهِۦ سَحَابٞۚ ظُلُمَٰتُۢ بَعۡضُهَا فَوۡقَ بَعۡضٍ إِذَآ أَخۡرَجَ يَدَهُۥ لَمۡ يَكَدۡ يَرَىٰهَاۗ وَمَن لَّمۡ يَجۡعَلِ ٱللَّهُ لَهُۥ نُورٗا فَمَا لَهُۥ مِن نُّورٍ﴾[4] یان: وەك لە تاریکستانێ، لەزەویەکی بێ پەیدا شەپۆل لەسەر شەپۆل دای پۆشێ و لەلای ژوورووشی هەور بێ، تاریکایی بارە لەسەر تاریکایی و هەرکاتێ کە دەستی خۆی

[1] الطبری /١٧٩/٢٣ ص٤١.
[2] الحاکم /٢/٤٩٥.
[3] النور ٣٩.
[4] النور ٤٠.

دەربخا، لەوانەیە هەر نەیبینێ. هەرکەسێ خودا ڕوناکی نیشان نەدا، هیچ ڕووناکیەکی نیە. لێرەدا خودای گەورە خوانەناسانی کردووە بە دوو بەشەوە. بانگخوازو چاولێکەر، وەك لەسەرەتای سوورەتی حەجدا باسی کردوون و ئەفەرموێت: ﴿وَمِنَ ٱلنَّاسِ مَن يُجَـٰدِلُ فِى ٱللَّهِ بِغَيْرِ عِلْمٍ وَيَتَّبِعُ كُلَّ شَيْطَـٰنٍ مَّرِيدٍ﴾[1] هێندێ کەس هەن، بەبێ ئەوە هیچ تێبگەن کێشە لەسەر خودا دەکەن و دەکەونە شوێن هەموو شەیتانێکی بەدفەڕ. وە ئەفەرموێت: ﴿وَمِنَ ٱلنَّاسِ مَن يُجَـٰدِلُ فِى ٱللَّهِ بِغَيْرِ عِلْمٍ وَلَا هُدًى وَلَا كِتَـٰبٍ مُّنِيرٍ﴾[2] لەناو خەڵکی هی وا هەیە، لەسەر خودا کێشە دەکا، بێئەوەی هیچی لێبزانێ، نە هیچ شارەزایە و نە کتێبێ بۆی ڕوون بکاتەوە. وە خودای گەورە لە سەرەتای سوورەتی واقعە و کۆتاییەکەیدا و وە لەسوورەتی ئینسانیشدا خاوەنباوەڕانی کردووە بە دوو بەشەوە: ئەوانەی لە پێشەوەن لە نزیکەکانن. وە ئەوانەی دەستی ڕاست لە ئاکار چاکەکانن. بە کورتی لە کۆی ئەم ئایەتە پیرۆزانەوە دەردەکەوێ کە خاوەن باوەڕانیش دوو بەشن. نزیکەکان و ئاکارچاکەکان. خوانەناسانیش دووبەشن: بانگکەران و چاولێکەران. دووڕووەکانیش هەر دوو بەشن: دووڕووی تەواو دووڕویەك کە بەشێکی دووڕوویی تێدایە. وەك لە هەردوو سەحیحەکەدا هاتووە: سێ شت هەرکەس تێیدا بێت ئەوە دووڕووی تەواوە، هەرکەسیش یەکێکیانی تێدا بێت ئەوە سیفەتێکی دووڕووی تێدایە، تا دەستی لێ هەڵدەگرێ، هەرکات قسەی کرد درۆبکات، هەرکات پەیمانی دا بیشکێنێ، ئەگەر سپاردەی لا دانرا خیانەت لێبکات[3]. ئەم فەرمودەیان کردوەتە بەڵگە لەسەر کەسێ کە لەوانەیە بەشێکی بڕوای تێدا بێت یان بەشێکی دووڕوویشی تێدا بێت. دیارە ئەمە کرداریە بە پێی ئەم فەرمودەیە کە باسمان کرد یان بیرو باوەڕیە وەك ئایەتەکان بەڵگە بوون لەسەری.

### بەشەکانی دڵ

ئیمامی ئەحمەد ڕیوایەتی کردووە لە ئەبو سەعیدەوە ئەڵێت: پێغەبەری خودا(ﷺ) ئەفەرموێت: دڵەکان چوارن: دڵی خاوێن و تەواو وەك چرای تێدا بێت ئەدرەوشێتەوە. وە دڵی داپۆشراو کە پەیوەست بێت بە بەرگەکەیەوە. دڵی بەسەر خۆدا هەڵگەڕاوە، وە دڵی دووڕوویش، دڵە خاوێنەکە دڵی خاوەنباوەڕە چراکەیش ڕووناکیەکەیەتی لە ناویدا. دڵی داپۆشراو دڵی خوانەناسە. دڵی هەڵگەڕاوە بەسەر خۆیدا دڵی دووڕووی تەواوە، ناسیویە پاشان حاشای کردووە. بەڵام دڵی دووڕوو دڵێکە بڕواو دووڕوویشی تێدایە وێنەی باوەڕ تێیدا وەك دانەوێڵە وایە، ئاوی باشی پێبگا. وێنەی دووڕووی تێدا

---

[1] الحج ٣.

[2] الحج ٨.

[3] فتح الباری /١١١/١ ص٤٢.

وەك برینێ وایە کە کێمە و خوێنی تێ دەچۆڕێ. هەر یەکێ لەو دوانە سەرکەوت بەسەر ئەوی ترا زاڵ بووە بەسەریدا[1]. ئەم فەرمودە سەنەدەکەی چاك و حەسەنە. خودای گەورە ئەفەرموێت: ﴿وَلَوْ شَآءَ ٱللَّهُ لَذَهَبَ بِسَمْعِهِمْ وَأَبْصَـٰرِهِمْ ۚ إِنَّ ٱللَّهَ عَلَىٰ كُلِّ شَىْءٍ قَدِيرٌ﴾ خۆ ئەگەر خوا بیویستایە گوێ و چاوی لە کار دەخستن، بێگومان خودا هەموو شتێکی پێدەکرێ. مەحەمەدی کوڕی ئیسحاق ڕیوایەتی کردووە لە ئیبنو عەباسەوە لەم ئایەتەدا: ﴿وَلَوْ شَآءَ ٱللَّهُ لَذَهَبَ بِسَمْعِهِمْ وَأَبْصَـٰرِهِمْ ۚ إِنَّ ٱللَّهَ عَلَىٰ كُلِّ شَىْءٍ قَدِيرٌ﴾ ئەگەرخودا بیویستایە گوێ و چاوی لە کار دەخستن بێگومان خودا توانای بەسەر هەموو شتێکا هەیە. ئەڵێت: دوای ئەوە کە هەقیان ناسی و وازیان لێهێنا واتە: خودا خاوەن تواناو دەسەلأتە ئەگەر بیهەوێ کەسێ سزا بدا یان عەفووی بکا[2]. ئیبنو جەریرئەڵێت: بۆیە خودای گەورە وەسفی خۆی دەکا بە خاوەن دەسەلأت بەسەر هەموو شتێکا لێرەدا. چونکە دووڕووەکان دەترسێنێ لە تواناو دەسەلأتی خۆی. ئاگاداریان دەکا کە هەمیشە ئاگای لێیانەو دەتوانێ گوێ و چاویان لە کار بخاو لێیان بسێنێتەوە[3]. ئیبنو جەریر و زۆرێك لە زانایانی تەفسیر کەلەگەڵ ئەون دەڵێن: ئەو دوو نمونەیە بۆ کۆمەڵێك لە دووڕووەکان هێنراوەتەوە وە (أو) لەمەدا کە خوای گەورە ئەفەرموێت: ﴿ أَوْ كَصَيِّبٍ مِّنَ ٱلسَّمَآءِ ﴾ یان وەك کەسانێ کە بارانی بە تەوژمیان لە ئاسمانەوە بۆ بباریێ بە مانای (الواو)ە وەك خودای گەورە ئەفەرموێت: ﴿وَلَا تُطِعْ مِنْهُمْ ءَاثِمًا أَوْ كَفُورًا﴾[4] هەرگیز گوێ لەوانە مەگرە تاوابار یان پێنەزانن. (أو) لێرەدا بۆ سەرپشکیە، واتە: ئەگەر حەز دەکەی ئاوا نمونەیان بۆ بێنەوە یان دەشتهەوێ ئاوا بۆیان بێنەوە. قورتوبی ئەڵێت: بۆ یەکسانیە وەك: جالس الحسن أو إبن سیرین، لەسەر ئەوەی زەمەخشەری ئەڵێت: هەردووکیان وەك یەکن لە دانیشتن لەلایان. ماناکەی لەو ئایەتە دەچێ کە خودای گەورە ئەفەرموێت: نمونەیان بەوە بۆ بێنیتەوە یان بەوە وەك یەکە، ڕێك و تەواوە بۆ حاڵی ئەوانە.

﴿يَـٰٓأَيُّهَا ٱلنَّاسُ ٱعْبُدُوا۟ رَبَّكُمُ ٱلَّذِى خَلَقَكُمْ وَٱلَّذِينَ مِن قَبْلِكُمْ لَعَلَّكُمْ تَتَّقُونَ ﴿٢١﴾ ٱلَّذِى جَعَلَ لَكُمُ ٱلْأَرْضَ فِرَٰشًا وَٱلسَّمَآءَ بِنَآءً وَأَنزَلَ مِنَ ٱلسَّمَآءِ مَآءً فَأَخْرَجَ بِهِۦ مِنَ ٱلثَّمَرَٰتِ رِزْقًا لَّكُمْ ۖ فَلَا تَجْعَلُوا۟ لِلَّهِ أَندَادًا وَأَنتُمْ تَعْلَمُونَ ﴿٢٢﴾﴾

---

[1] أحمد /١٧/٣/ ص٤٢ لاوازە.

[2] ابن ابی حاتم /٧٦/١/.

[3] الطبری/٣٦١/١/.

[4] الانسان ٢٤.

**ناسینی خودا بە تەنیا ( توحید الالوهیه )**

خودای گەورە ئەفەرموێت: ﴿يَٰٓأَيُّهَا ٱلنَّاسُ ٱعۡبُدُواْ رَبَّكُمُ ٱلَّذِي خَلَقَكُمۡ وَٱلَّذِينَ مِن قَبۡلِكُمۡ لَعَلَّكُمۡ تَتَّقُونَ ٢١ ٱلَّذِي جَعَلَ لَكُمُ ٱلۡأَرۡضَ فِرَٰشٗا وَٱلسَّمَآءَ بِنَآءٗ وَأَنزَلَ مِنَ ٱلسَّمَآءِ مَآءٗ فَأَخۡرَجَ بِهِۦ مِنَ ٱلثَّمَرَٰتِ رِزۡقٗا لَّكُمۡۖ فَلَا تَجۡعَلُواْ لِلَّهِ أَندَادٗا وَأَنتُمۡ تَعۡلَمُونَ﴾ ئەی خەڵکینە ! هەر ئەو خودایە بپەرستن کە ئێوەو زۆری تریش پێش ئێوەی وەدی هێناوە،بەڵکو خۆتان بپارێزن. ئەو خودایە زەوی بۆ کردوون بە ڕایەخ، ئاسمانی بەرز کردوەتەوەو ئاوی لەو ئاسمانەوە بۆ باراندن. هەموو جۆرە بەروبومێکی بەهۆی ئەو ئاوەوە بۆ ڕواندن، جا کە ئەوەیان زانیوە چۆن شەریك بۆ ئەو خودایە دائەنێن؟ خودای گەورە دێتە سەر باسی ناسینی خوداو پەرستنی بە تەنیا، چونکە هەر خودا خاوەن بەهرەی فراوانە بەسەر عەبدەکانیەوە، کە لە نەبوون هێناوینیەتە سەر دونیا، ئەو هەموو بەهرە زۆرە دیارو نەدیارەی بەسەرا ڕژاندون ئووسا زەوی کردووە بە ڕایەخ بۆیان بۆ حەسانەوە بۆیان. بە شێوەیەکی ڕێك و پێك دای مەزراندووە بۆیان ﴿وَٱلسَّمَآءَ بِنَآءٗ﴾ ئاسمانی بەرز کردوەتەوە. وەك لە ئایەتێکی ترا ئەفەرموێت: ﴿وَجَعَلۡنَا ٱلسَّمَآءَ سَقۡفٗا مَّحۡفُوظٗاۖ وَهُمۡ عَنۡ ءَايَٰتِهَا مُعۡرِضُونَ﴾[1] ئاسمانیشمان کردوو میچێك وسەقفێکی پارێزراو. کەچی ئەوان لەو هەموو نیشانەی کە تێیدان خۆ لائەدەن: ﴿وَأَنزَلَ مِنَ ٱلسَّمَآءِ مَآءٗ﴾ ئاوی لەو ئاسمانەوە بۆ باراندن. مەبەست لێرەدا هەورەکانە. لەکاتی خۆیدا بە پێی پێویستیان بۆیان دەبارێنێ، بەهۆی ئەو بارانەوە چەندین جۆر بەرو بووم و کشتوکاڵیان بۆ دەڕوێنێ، بۆ ئەوەی بژێوی خۆیانی پێ دابین بکەن و ماڵاتەکانیشیانی پێبەخێو بکەن. وەك لە شوێنی ترا لە قورئانی پیرۆزدا باسی هاتووە. وە ئەو ئایەتەی کە زۆر لەم ئایەتە دەچێ، ئەم ئایەتەیە کە خودای گەورە ئەفەرموێت: ﴿ٱللَّهُ ٱلَّذِي جَعَلَ لَكُمُ ٱلۡأَرۡضَ قَرَارٗا وَٱلسَّمَآءَ بِنَآءٗ وَصَوَّرَكُمۡ فَأَحۡسَنَ صُوَرَكُمۡ وَرَزَقَكُم مِّنَ ٱلطَّيِّبَٰتِۚ ذَٰلِكُمُ ٱللَّهُ رَبُّكُمۡۖ فَتَبَارَكَ ٱللَّهُ رَبُّ ٱلۡعَٰلَمِينَ﴾[2] ئەو خودایە سەرزەمینی بۆ ئێوە کردە نیشتەجێ، ئاسمانیشی لەسەر بەرز کردوونەوە، ئەو بیچمەی بە ئێوەی داوە لە هەموو بیچمێك جوانترە. بژێوی باشی پێداون، هەر ئەوە خودای پەروەردگارتان، بەرزی و پیرۆزی بۆ خودا کە پەروەردگاری دنیایە. مەبەست ئەوەیە: کە خودای گەورەوەدی هێنەرو بژێوی دەرو خاوەن ماڵ و ئەو کەسانەیشە کە تێیدا نیشتەجێن و ڕۆزی دەریشیانە، هەر بۆیە ئەو خودایە شایستەیە کە بەتەنیا بپەرسترێ و هیچ شتێ

---

[1] الانبیاء ٣٢.

[2] غافر ٦٤.

نەکرێ بە هاوبەشی. وە ئەفەرموێت: ﴿فَلَا تَجْعَلُوا لِلَّهِ أَندَادًا وَأَنتُمْ تَعْلَمُونَ﴾ کەواتە: هاوتا بۆ خودا پەیدا مەکەن. کە ئێوە خۆتان دەزانن بێهاوتایە. وە لە هەردوو سەحیحەکەدا هاتووە لە ئیبنو مەسعودەوەئەڵێت: وتم: ئەی پێغەمبەری خودا! چ تاوانێ لەلای خودا گەورەترە؟ فەرمووی: هاوتا بۆ خودا پەیدا بکەی کە ئەو دروستی کردووی[1]. وە فەرمودەکەی مەعازیش کە ئەفەرموێت: ئایە دەزانی هەقی خودا کامەیە لەسەر عەبدەکانی؟ بیپەرستن و لە هیچ شتێکا شەریکی بۆ دانەنێن[2]. وە لە فەرمودەیەکی ترا هاتووە: با هیچ کەسێ لە ئێوە نەڵێت خوا ویستی لێبێ و فلانیش بیەوێ، بەڵکو بڵێ: خوا مەیلی لێبێ و پاشان فلانیش بیەوێ[3].

### بەڵگە لەسەر بوونی خودای گەورە

زۆرێ لەزانایانی تەفسیر وەك ڕازی و کەسانی تریش بەڵگەیان لەسەر بوونی خودای گەورە هێناوەتەوە، هەرکەسێ بەوردی سەیری ئەم بوونەوەرە بکا لەسەر زەوی و ئاسمانەکانداو جیاوازی شێوە و ڕەنگ و سروشت و سودەکانی و دانانی بەو شێوە پڕ سوود و پیتەوە. تواناو دەسەڵاتی ئەو وەدی هێنەرە کارزانی بۆ دەردەکەوێ بە چاکی. تێدەگا لە زانیاری و جوانی و وردەکاری ئەو دەسەڵاتە مەزن و بێ پایانەی خودای گەورە. وەك هەندێ لە عەرەبەکان وتویانە: کە پرسیار کراوە بەڵگە چیە لەسەر بوونی خودای گەورە؟ وتیان: پاك و بێعەیبی بۆ خودا: پاشەڕۆی وشتر دەبێتە بەڵگە لەسەر وشتر، جێ پێ دەبێتە بەڵگە لەسەر ئەوە کەسێك ڕۆشتووە. ئەم ئاسمانە بەوهەموو بورجەوەو زەمین بەم گشت ڕێگا و دەریاکان بەو شەپۆلانەوە ئایە ئەمانە هەموو بەڵگە نین لەسەر بوونی خودایەکی وردیلە بینی هەرە زانا؟[4] هەرکەسێ بەوردی تێرامابێ لەبەرزی ئەم ئاسمانانە و فراوانیان و بوونی ئەو گشت ئەستێرە گەورەو بچوك و ڕوناکە لە ئەستێرەی گەڕۆك و جێگیر و وە سەیری ئەو دەریایانە بکا کە دەوری زەمینی داوە لە گشت لایەکەوە، وە ئەو کێوانە کە چوون بە ناخی زەویدا بۆ ئەوەی ڕاوەستێ و ئەوانەی لەسەری نیشتەجێن بە هەموو شێوەو ڕەنگەکانیەوە لەسەری بژین. وەك خودای گورە ئەفەرموێت: ﴿وَمِنَ الْجِبَالِ جُدَدٌ بِيضٌ وَحُمْرٌ مُّخْتَلِفٌ أَلْوَانُهَا وَغَرَابِيبُ سُودٌ ﴿٢٧﴾ وَمِنَ النَّاسِ وَالدَّوَابِّ وَالْأَنْعَامِ مُخْتَلِفٌ أَلْوَانُهُ كَذَٰلِكَ ۗ إِنَّمَا يَخْشَى اللَّهَ مِنْ عِبَادِهِ الْعُلَمَاءُ﴾[5] لە کێوەکانیش ڕێگاو

---

[1] فتح الباری /٨/٣٥٠/، مسلم /١/٩٠ ص٤٢.

[2] فتح الباری /١٣/٣٥٩/، مسلم/١/٩٠.

[3] أحمد /٥/٣٨٤/٣٩٤/٣٩٨/سەحیحە.

[4] الرازی /٢/٩١ ص٤٣.

[5] فاطر ٢٧–٢٨.

بانی سپی و سووری جۆراو جۆر بە ڕەنگ وەدی هێنا، ڕەش وەك قەلە ڕەشیشیان تێدایە. لە مەردم و جانەوەرو مالآتیشا، هەروەهایە، ڕەنگیان لە یەکتر جیایە، لەناو عەبدانی خودادا هەر ئەوانەی زۆر زانان لێی دەترسن. وە ئەو ڕووبارانەی لە ولاتێکەوە دەڕوات بۆ ولاتێکی تر بۆ سوود لێوەرگرتن و ئەو گشت ئاژەڵ و گیانەوەرانە هەمە جۆرو گژو گیا جیاواز و کە هەریەکە تام و ڕنگ و بۆنێکیان هەیە لەگەڵ یەك زەوی یەك خۆڵ و سروشت و ئاودا، ئەمانە هەموو بەڵگەن لەسەر بوونی خودایەك کە وەدیهێنەری خاوەن دەسەلاتی گەورەی کارزانی بەبەزەییە بۆ دروستکراوەکانی و سۆزو چاکەی بێسنووری دەریارەیان، هیچ پەرستراوو پەروەردگارێك نیە غەیرەز ئەو. هەر بۆ لای ئەو دەگەڕێینەوەو پشت و پەنامان هەر خودایە، ئایەت لەم بارەیەوە لە قورئانی پیرۆزدا ئێجگار زۆرە.

﴿وَإِن كُنتُمْ فِي رَيْبٍ مِّمَّا نَزَّلْنَا عَلَىٰ عَبْدِنَا فَأْتُوا بِسُورَةٍ مِّن مِّثْلِهِ وَادْعُوا شُهَدَاءَكُم مِّن دُونِ اللَّهِ إِن كُنتُمْ صَادِقِينَ ﴿٢٣﴾ فَإِن لَّمْ تَفْعَلُوا وَلَن تَفْعَلُوا فَاتَّقُوا النَّارَ الَّتِي وَقُودُهَا النَّاسُ وَالْحِجَارَةُ أُعِدَّتْ لِلْكَافِرِينَ ﴿٢٤﴾﴾

**سەلماندنی پەیامی پێغەمبەر (ﷺ)**

خودای گەورە ئەفەرمویێت: ﴿وَإِن كُنتُمْ فِي رَيْبٍ مِّمَّا نَزَّلْنَا عَلَىٰ عَبْدِنَا﴾ ئەگەر لەمەی ئێمە بۆ عەبدی خۆمان ناردۆتە خوارەوە بە گومانن و پێشتان وایە ڕاستی بۆ چوون. دەسا ئێوە لەگەڵ هاو باوەڕەکانتان بە کۆمەکێی یەکتر جگە لە خودا سوورەتێکی وەك ئەو بێنن. پاشان خودای گەورە دێتە سەر باسی ناردنی پێغەمبەر (ﷺ) دوای ئەوە کە فەرمووی هیچ شتێ بۆ پەرستن ناشێ جگە لە خودا، ڕووی وتاری دەکاتە خوانەناسان و ئەفەرمویێت: ﴿وَإِن كُنتُمْ فِي رَيْبٍ مِّمَّا نَزَّلْنَا عَلَىٰ عَبْدِنَا﴾ ئەگەر لەمەی ئێمە ناردوومانەتە خوار بۆ عەبدی خۆمان یانی مەحەمەد (ﷺ) بە گومانن ﴿فَأْتُوا بِسُورَةٍ مِّن مِّثْلِهِ﴾ سوورەتێکی وەك ئەو قورئانەی ئەو بێنن، ئەگەر دەڵێن لە خواوە بۆی نەهاتووە. سادەی ئێوەش هەر بەوێنەی ئەوەی کە هێناویەتی بێنن و بەرپەرچی بدەنەوە، هەرچیش لەتواناتاندایە لەو بارەیەوە بەکاری بهێنن جگە لە خوداو بیکەنە هاوکاری خۆتان، گومانی تێدانیە ئەوەتان بۆ ناکرێ. ئیبنو عەباس ئەڵێت: ﴿شُهَدَاءَكُم﴾ دارو دەستەکانتان[1]. سوددی لە ئەبو مالیکەوە ئەڵێت: هاوکارەکانتان واتە: کۆمەڵێکی تر یارمەتیتان بدەن بۆ ئەوە. یانی: داوای هاوکاری بکەن لە پەرستووەکانتان بێن بە دەمتانەوەو یارمەتیتان بدەن[2]. موجاهیدئەڵێت: ﴿وَادْعُوا شُهَدَاءَكُم﴾ خەڵکانێ کەشایەتی بۆبدەن[1]. یانی: لە دەسەلات دارانی زمان پاراو.

---

[1] الطبری /١/٣٧٦ ص٤٣.

[2] ابن ابی حاتم /١/٨٤.

**بەرەنگار بوونەوەو دەرئاسایی (التحدی والاعجاز)**

خودای گەورە بەم شێوە لە چەندین شوێندا لە قورئانی پیرۆزا بە گژیاندا چوەتەوەو بەرەنگاریان بووە وەك لە سوورەتی قەسەسدا ئەفەرموێت: ﴿ قُلْ فَأْتُوا۟ بِكِتَـٰبٍ مِّنْ عِندِ ٱللَّهِ هُوَ أَهْدَىٰ مِنْهُمَآ أَتَّبِعْهُ إِن كُنتُمْ صَـٰدِقِينَ ﴾[2] بڵێ: ئەگەر ئێوە ڕاست دەكەن، نوسراوێك لە خواوە بێنن كە لە هەردووكیان زیاتر ڕاستە ڕێگا نیشان بدا، تا من شوێنی كەوم. وە لە سوورەتی ئیسرادا ئەفەرموێت: ﴿ قُل لَّئِنِ ٱجْتَمَعَتِ ٱلْإِنسُ وَٱلْجِنُّ عَلَىٰٓ أَن يَأْتُوا۟ بِمِثْلِ هَـٰذَا ٱلْقُرْءَانِ لَا يَأْتُونَ بِمِثْلِهِۦ وَلَوْ كَانَ بَعْضُهُمْ لِبَعْضٍ ظَهِيرًا ﴾[3] بڵێ: ئەگەرمرۆڤ و جنۆكە هەموو كۆببنەوە، وێنەی ئەم قورئانە بێنن، ناتوانن بە وێنەی بێنن، با هەمووشیان پشتیوانی یەكتری بكەن. وە لە سوورەتی هوودا ئەفەرموێت: ﴿أَمْ يَقُولُونَ ٱفْتَرَىٰهُ ۖ قُلْ فَأْتُوا۟ بِعَشْرِ سُوَرٍ مِّثْلِهِۦ مُفْتَرَيَـٰتٍ وَٱدْعُوا۟ مَنِ ٱسْتَطَعْتُم مِّن دُونِ ٱللَّهِ إِن كُنتُمْ صَـٰدِقِينَ ﴾[4] یان دەڵێن: هەڵی بەستووە، بڵێ: ئەگەر قسەی ئێوەڕاستە، دەسا ئێوە بەیارمەتی هەركەسێ دەستتان دەكەوێ جگە لە خودا وە سوورەتی هەڵبەستە هەر وەك ئەم بێنن. وە لە سوورەتی یونسدا ئەفەرموێت: ﴿ وَمَا كَانَ هَـٰذَا ٱلْقُرْءَانُ أَن يُفْتَرَىٰ مِن دُونِ ٱللَّهِ وَلَـٰكِن تَصْدِيقَ ٱلَّذِى بَيْنَ يَدَيْهِ وَتَفْصِيلَ ٱلْكِتَـٰبِ لَا رَيْبَ فِيهِ مِن رَّبِّ ٱلْعَـٰلَمِينَ ﴾[5] ناگونجێ ئەم قورئانە هی خودا نەبێ و هەڵبەسترابێ. ئەم قورئانە بڕوای هەیە بەو كتێبەی كەوا لە پێشا هاتووەو ئێستا لەبەر دەستی دایەو ڕۆشنیشی دەكاتەوە، هیچ گومانی تێدا نیە لە لایەن پەروەردگاری هەموو جیهانەوەیە. یان دەڵێن: خۆی هەڵی بەستووە بڵێ: ئەگەر بەڕاستیتانە خۆتان و هەركەسێكی تر كە دەتوانن جگە لە خودا بانگی بكەن تاقە سوورەتێكی وەك ئەم بێنن. ئەم ئایەتانە هەموو ئایەتی مەكین. واتە: لە مەككە هاتونەتە خوارەوە، پاشان دیسان لە مەدینەیشا هەر بەرەنگاریان بۆتەوەولەم ئایەتەدا ئەفەرموێت: ﴿ وَإِن كُنتُمْ فِى رَيْبٍ مِّمَّا نَزَّلْنَا عَلَىٰ عَبْدِنَا ﴾ ئەگەر لەمەی ئێمە بۆ عەبدی خۆمان یانی موحەمەد(ﷺ) ناردۆتە خوار بە گومانن. ﴿فَأْتُوا۟ بِسُورَةٍ مِّن مِّثْلِهِۦ ﴾ سوورەتێكی وەك ئەو بێنن. یانی: وەك وێنەی قورئان. ئەمە قسەی موجاهید و قەتادەیە و ئیبنو

---

[1] ابن ابی حاتم /١/٨٥.

[2] القصص ٤٩.

[3] الاسراء ٨٨.

[4] هود ١٣.

[5] یونس ٣٧–٣٨.

جەریری تەبەری و زەمەخشەری و ڕازیش هەروایان وتووە، لە عومەرو ئیبنو مەسعودو ئیبنو عەباس و حەسەنی بەسری و زۆریێ لە لێکۆڵەرەوەکانیشەوە هەموو یەك دەنگن کە خودای گەورە بەرەنگاری هەموویان بوەتەوە، بە نەخوێندەوارو ئەوانیش ئەهلی کتێبن. هەموو بەیەکەوەو هەریەکە بە جیایش. ئەمە ئیتر ئەوپەڕی بەرەنگار بوونەوەیە بۆیان، چونکە ئەمە بۆ چەند کەسێکی نەخوێنەوار نیە تەنیا کە نازانێ بنوسێ و هیچ شارەزاییەکی نیە، بە پێی ئەم ئایەتە کە خودای گەرە ئەفەرموێت: ﴿فَأْتُواْ بِعَشْرِ سُوَرٍ مِّثْلِهِۦ﴾ دە سوورەتی وەك ئەمە بێنن. وە ئەفەرموێت: ﴿لَا يَأْتُونَ بِمِثْلِهِۦ﴾ ناتوانن بەوێنەی بێنن. ئەم بەگشتدا چوونەوەیە گشتگیرەو بۆ هەموویانە، لەگەڵ ئەوەدا کە ئەم عەرەبانە زمان ڕەوان ترین کەسن کەچی خودای گەورە بەرەنگاریان بوەتەوە بەم شێوە لە مەککەیش و لە مەدینەیشا چەند جار کە ئەوانە زۆر دوژمنی پێغەمبەر(ﷺ) بوون و دژی ئاینەکەشی بوون. کەچی نەیان توانی هیچ شتێ بکەن و هیچیشیان لەدەست نەهات لەو بارەیەوە. وەك خودای گەرە ئەفەرموێت: ﴿فَإِن لَّمْ تَفْعَلُواْ وَلَن تَفْعَلُواْ﴾ ئەگەر نەتان کرد کە هەرگیز بۆتان ناکرێ. (وَلَن) بۆ جەخت کردنەوەیە لە داهاتودا واتە: هەرگیز ناتوانن ئەوە بکەن ئەمەیش موعجیزەیەکی ترە. هەواڵێکی داوەو جەختیشی لەسەر دەکاتەوە بەبێ هیچ ترسێك کە ئەم قورئانە هیچ کەسێ تا هەتایە ناتوانێ دژی بوەستێ و بەرەنگاری ببێتەوە تا کۆتایی دونیا، هەر وایش دەرچوو تا ئێستاو ئەم چەرخەی ئێمەش کەس نەی توانیوە بەرەنگاری ببێتەوەو هەر ناشبێ. چون کەس دەتوانێ شتی وەك قورئان بێنێ و کە قورئان فەرمودەی خودایە و کە وەدی هێنەری هەموو شتێکە، فەرموودەی خودا چۆن لە قسەی دروستکراوەکانی دەچێت.

### لە ڕوەکانی ئیعجازی قورئانەوە

هەرکەسێ وورد بێتەوە لە قورئان و سەیری دیمەنەکانی ئیعجازی قورئان بکا،هونەری دیارو نەدیار و شاراوەی زۆر دەبینێ لە شێوەی وتەو هەم مانایشا، خودای گەورەئەفەرموێت: ﴿الٓر ۚ كِتَٰبٌ أُحْكِمَتْ ءَايَٰتُهُۥ ثُمَّ فُصِّلَتْ مِن لَّدُنْ حَكِيمٍ خَبِيرٍ﴾[1] الیف، لام، را، کتێبێکە بەڵگەکانی پتەو کراون و لەپاشان لەلایەن کارزانی زاناش کراونەتەوە، وتەکانی پتەو کراون و ماناکانیشی ڕوون و ئاشکرا کراون. هەموو وتەو ماناکانی ڕەوانەو ئەو لاو لای تێدا نیە، هەواڵی دەربارەی نەدیارەکانی ڕابردوو داوە کە ڕوویان داوە وەك خۆی بەبێ کەم و زیاد. فەرمانی بە گشت چاکەیەك داوە، قەدەغەی هەموو خراپەیەکی کردووە. وەك فەرمویەتی: ﴿وَتَمَّتْ كَلِمَتُ رَبِّكَ صِدْقًا وَعَدْلًا﴾[2] قسەکانی پەروەردگارت لەبێلایەنگری و ڕاستیدا

[1] هود ١.

[2] الانعام ١١٥.

تەواو بێ کەم و کوڕین. واتە: ڕاستە لە هەواڵەکانیدا و بێ کەم و کوڕیە لە فەرمانەکانیدا، هەمووی ڕاست و هەق و تەواو ڕێ نیشاندەرە. هەڵە ڕۆیی و درۆ و بوختانی تێدا نیە، وەك لە شیعری عەرەب و شتەکانی تریاندا هەیە لە درۆ کردن و هەڵە ڕۆیی کە شیعرەکانیان جوان دەرناچێ بەوە نەبێ، وەك دەربارەی شیعر وتراوە: خۆشترینیان درۆترینیانە. لە هۆنراوە زۆر درێژەکانیاندا دەبینی کە زۆرێکیان لە باس و وەسفی ژناندا یان ئەسپ و ماین و مەیدا بەکارهێناوە یان بە هەڵدان بە پیاوێکی تایەبەتیدا یان ئەسپێ یان جەنگێ یان وشترێ یان لە ترسێکا یان درندەیەك یان هەر شتێکی تر لەو شتانەی کە چاویان پێی کەوتووەو دیویانە کە هیچ سوودێکی لێوەرنەگیراوە جگە لەدەر خستنی توانای ئەو کەسەی کە ئەو شتە نەدیارو وردانەی دەرخستووە،یان شتێکی دیارو ئاشکرای باس کردووە،پاشان دەبینی پارچە شعرێ یان دوو پارچە شعریان زیاتر لەو بارانەوە وتراوە. ئەوی تری هەڵەوەڕی و چەنەبازی نەبێ شتێ تر نەبووە. بەڵام قورئانی پیرۆز هەمووی لەو پەڕی ڕەوانبێژیدایە لەلای ئەوانەی شارەزایی تەواویان دەربارەی زمانی عەرەبی هەیە. خۆ ئەگەر سەرنجت دابێ و بەوردی سەیری هەواڵەکانت کردبێ، هەواڵەکانی زۆر خۆشن با هەواڵەکانی بە کورتی باس کرابن یان بە درێژی. یان دووبارە بووبنەوە یان نا. تا دووبارە بوبێتەوە زیاتر جوان و بەهرەدارتر بووە، وتەی هیچ کەسێ لە وتەی قورئان ناچێ. زانایان لێی وەڕس نابن،کە دێتە سەر هەڕەشەو گوڕەشەیش کێوە سەخت و ڕەفەمان دێنێتە لەرزە، ئەی ڕات چیە دەربارەی دڵە وشیارەکان؟ ئەگەر ئەو بەڵێنانەیان پێدرا کە دڵ و گوێیان دەکاتەوە و تامەزرۆی ماڵی هێمن و ئاشتین و نزیکی تەختی عەرش ڕەحمانن یك خودای گەورە هانای خاوەنباوەڕان ئەدا بۆی و ئەفەرموێت: ﴿ فَلَا تَعۡلَمُ نَفۡسٞ مَّآ أُخۡفِيَ لَهُم مِّن قُرَّةِ أَعۡيُنٖ جَزَآءَۢ بِمَا كَانُواْ يَعۡمَلُونَ ﴾[1] کەس نازانێ لەباتی ئەو کارانەی کردوویانە چ پاداشتێکی چاو ڕۆشن کەرەوەیان بۆ ئامادە کراوە، وە ئەفەرموێت: ﴿وَفِيهَا مَا تَشۡتَهِيهِ ٱلۡأَنفُسُ وَتَلَذُّ ٱلۡأَعۡيُنُۖ وَأَنتُمۡ فِيهَا خَٰلِدُونَ﴾[2] هەرچی دڵ ئارەزوی دەکاو چاو لەزەتی لێدەبینێ تێیدا هەیەو ئێوەش هەر لەوێدا دەمێنن نامرن وە دەربارەی ترسانیش ئەفەرموێت: ﴿ أَفَأَمِنتُمۡ أَن يَخۡسِفَ بِكُمۡ جَانِبَ ٱلۡبَرِّ﴾[3] ئایا ئێوە لەوە ناترسن کە لەوشکایدا بتان بات بەناخی زەویدا. وە ئەفەرموێت: ﴿ءَأَمِنتُم مَّن فِي ٱلسَّمَآءِ أَن يَخۡسِفَ بِكُمُ ٱلۡأَرۡضَ فَإِذَا هِيَ تَمُورُ ١٦ أَمۡ أَمِنتُم

[1] السجدة ١٧.

[2] الزخرف ٧١.

[3] الاسراء٦٨.

مَن فِي ٱلسَّمَآءِ أَن يُرۡسِلَ عَلَيۡكُمۡ حَاصِبٗاۖ فَسَتَعۡلَمُونَ كَيۡفَ نَذِيرِ﴾[1] ئایە ئێوە لەو کەسەی لە ئاسمانە ترستان نیە، بایەکی توندی زیخ و چەوتان لێهەڵبکا؟ ئەوسا زوو دەزانن هەڕەشەی من چۆن بووە. وە لەبارەی سەرکۆنەوە ئەفەرموێت: ﴿فَكُلًّا أَخَذۡنَا بِذَنۢبِهِۦ﴾[2] ئێمە هەریەك لەوانەمان بە تاوانەکەی خۆیان گرت. وە دەربارەی ئامۆژگاری دەفەرموێت أَفَرَءَيۡتَ إِن مَّتَّعۡنَٰهُمۡ سِنِينَ ﴿٢٠٥﴾ ثُمَّ جَآءَهُم مَّا كَانُواْ يُوعَدُونَ ﴿٢٠٦﴾ مَآ أَغۡنَىٰ عَنۡهُم مَّا كَانُواْ يُمَتَّعُونَ﴾[3] تۆ پێم بڵێ: ئەگەر بڵێین چەند ساڵ ڕابوێرن، پاشان ئەو ئازارەی لێی ترسێنرابوون بێتە لایان. ئەو ماوەی کە ڕای دەبوێرن، چ بەهرەیەکیان بۆ ئەدات؟ لە چەندین شتی تریش لە جۆری ڕەوان بێژی و زمان پاراوی. هەرکاتێ ئەو ئایەتانە هاتن دەربارەی بڕیارو فەرمان و قەدەغەکراوەکان، فەرمان دەکا بە هەموو کارێکی چاك و بەسوودی خاوێن و خۆشەویست و قەدەغەی هەموو کارێکی خراپ و ناپەسەند و ناشرین دەکا. وەك ئیبنو مەسعودو کەسانی تریش لە زانایانی پێشینە وتویانە،کاتێ گوێت لێبوو خودای گەورە لە قورئاندا ئەفەرموێت: ﴿يَٰٓأَيُّهَا ٱلَّذِينَ ءَامَنُواْ﴾ ئەی کۆمەڵی خاوەنباوەڕان، زۆر چاك گوێی بۆ بگرە. چونکە ئەو چاکەیەکە فەرمانی پێدەکا یان خراپەیەکە قەدەغەی دەکا. هەربۆیە خوادی گەورە ئەفەرموێت: ﴿يَأۡمُرُهُم بِٱلۡمَعۡرُوفِ وَيَنۡهَىٰهُمۡ عَنِ ٱلۡمُنكَرِ وَيُحِلُّ لَهُمُ ٱلطَّيِّبَٰتِ وَيُحَرِّمُ عَلَيۡهِمُ ٱلۡخَبَٰٓئِثَ وَيَضَعُ عَنۡهُمۡ إِصۡرَهُمۡ وَٱلۡأَغۡلَٰلَ ٱلَّتِي كَانَتۡ عَلَيۡهِمۡ﴾[4] مانەی چاکەیان ئەداتێ و ناهێڵێ خراپە بکەن، خاوێنی بەڕەوا دەزانێ و پیس پێی ناڕەوایە، گرانباری زنجیرەیان لەسەر لا دەبا کە پێیان شەتەك دابوون، وە ئەگەر ئایەت هاتە خوار لە بارەی ڕۆژی قیامەت و ئەو سەختی و ناڕەحەتیەی تیایەتی و باسی بەهەشت و ئاگرو ئەوە کە خوای گەورە دای ناوە لەناویاندا و بۆ دۆستان و دوژمنانی لە خۆشی و لە ناخۆشی و ڕزگاری و سزای بە ژان و مژدە دەدات و هەڕەشەو ترساندن و بانگ کردن بۆ ئاکاری چاك و دورکەوتنەوە لە کلری خراپ و گوێ نەدان بە دنیا و هەوڵدان بۆ ڕۆژی قیامەت و ڕاوەستاوی لەسەر ڕەوشتە جوانەکان و شارەزا بوون لەسەر ڕێی ڕاست و ڕێبازە ڕاست و چاکەکەی و دورخستنەوەی دڵەکان لە پسی و چەپەڵی شەیتانی نەفرین لێکراو، زۆر بەباشی گوێی بۆ بگرە.

---

[1] الملك ١٦-١٧.

[2] العنكبوت ٤٠.

[3] الشعراء ٢٠٥-٢٠٧.

[4] الاعراف ١٥٧.

## قورئان گەورەترین موعجیزەیە بۆ پێغەمبەرمان محەممەد( ﷺ )

هەربۆیە لەهەردوو سەحیحەکەدا هاتووە لە ئەبو هورەیرەوە ڕەزای خوای لێبێت کە پێغەمبەری خودا ( ﷺ ) فەرمویەتی: هیچ پێغەمبەرێ نەبوە لە پێغەمبەرەکان سەلامی خوایان لێبێت مەگین چەند موعجیزەیەکی پێدراوە لەسەر ئەو موعجیزەیە ئەو خەلکە بڕوایان هێناوە، بەلام ئەوەی کە من پێم دراوە نیگایە خودا ئەو نیگایەی بۆ کردووم، هیوادارم کەوا من شوێنکەوتووم لەوان زیاتر بێت لە ڕۆژی قیامەتا. وتەکە هی موسلیمە، کە پێغەمبەر( ﷺ ) ئەفەرموێت: بێگومان ئەوەی کە بە من دراوە نیگایە. واتە: ئەوەی کە تایبەت کراوە بە منەوە لە نێوان ئەواندا ئەم قورئانەیە کە موعجیزەو لە توانا بەدەری مرۆڤە و ناتوانێ بەرەنگای ببێتەوە. بە پێچەوانەی کتێبەکانی تر کە خودای گەورە ناردویەتی،چونکە ئەو کتێبانەی تر موعجیزە نین لە لای زۆرێك لە زانایان و الله أعلم. وە پێغەمبەر ( ﷺ ) بەلگە زۆرە، لەسەر پێغەمبەرێتی و ڕاستی ئەو پەیامەی کە پێی ڕەوانە کراوە کە لە ژمارە نایەت سوپاس و ستایش بۆ خودای گەورە.

### مەبەست بە بەرد

خودای گەورە ئەفەرموێت: ﴿فَٱتَّقُواْ ٱلنَّارَ ٱلَّتِي وَقُودُهَا ٱلنَّاسُ وَٱلۡحِجَارَةُۖ أُعِدَّتۡ لِلۡكَٰفِرِينَ﴾ بترسن لەو ئاگرەی کە سووتەمەنیەکەی لەشی مرۆڤ و بەردەو هەر بۆ خوانەناسان هەلکراوە. (الوقود) ئەو سوتەمەنیەیە کە فڕێ ئەدرێتە ناو ئاگر بۆ هەلگیرساندنی لە دار و شتی تر. وەك خودای گەورە ئەفەرموێت: ﴿وَأَمَّا ٱلۡقَٰسِطُونَ فَكَانُواْ لِجَهَنَّمَ حَطَبٗا﴾[1] ئەوانەش کە لە ڕێگەی ڕاست لایان داوە، دەبنە داری سووتانی جەهەنەم. وە ئەفەرموێت: ﴿إِنَّكُمۡ وَمَا تَعۡبُدُونَ مِن دُونِ ٱللَّهِ حَصَبُ جَهَنَّمَ أَنتُمۡ لَهَا وَٰرِدُونَ ۝٩٨ لَوۡ كَانَ هَٰٓؤُلَآءِ ءَالِهَةٗ مَّا وَرَدُوهَاۖ وَكُلّٞ فِيهَا خَٰلِدُونَ﴾[2] ئێوە لەگەلێ ئەوانەی جگە لە خودا دەتان پەرستن هەموو دلری سوتانی جەهەنەمن و هەردەبێ بچنە ناویەوە. ئەگەر ئەو پەرستووانە وەك خۆیان دەلێن خوا بوونایە دیارە نەدەچوونە ناوی. ئێستا هەموویان تا هەتایە هەر لەوێدان. مەبەست بەبەرد لێرەدا کبریتە کە زۆر بە هێزو ڕەش و ڕەق و بۆندارە،لە هەموو بەردەکانی تر گەرمترە کە گەرم کرا خودا بمان پارێزێ لێی. وتراویشە: مەبەست پێی بەردی ئەو بت و هاوەلانەیە کە جگە لە خودا پەرستراون. وەك خودای گەورە ئەفەرموێت: ﴿إِنَّكُمۡ وَمَا تَعۡبُدُونَ مِن دُونِ ٱللَّهِ حَصَبُ جَهَنَّمَ﴾ ئێوەو ئەوانەی جگە لە خودا دەتان پەرستن هەموو سوتەمەنی جەهەنەمن. پاشان

---

[1] الجن ١٥.

[2] الانبیاء ٩٨-٩٩.

خودای گەورە ئەفەرموێت: ﴿أُعِدَّتۡ لِلۡكَٰفِرِينَ﴾ ئامادە کراوە بۆ خوانەناسان وا دیارە ئەو زەمیرە لە ﴿أُعِدَّتۡ﴾ دایە گەڕاوەتەوە بۆ ئەو ئاگرەی کە سوتەمەنیەکەی لەشی مرۆڤ و بەردە. هەڵیش دەگرێ ئەو زەمیرە بگەڕێتەوە بۆ بەردەکە هیچ جیاوازیەك لە نێوان ئەو دوو قسەیە نیە لە ماناداا، چونکە پەیوەستن بەیەکەوە ﴿أُعِدَّتۡ﴾ یانی: ئامادە کراوەو ساز دراوەبۆ ئەوانەی کە بڕوایان بە خوداو بە پێغەمبەرەکەی نیە، وەك ئیبنو ئیسحاق وتی لە مەحەمەدو عیکرەمەوە یان سەعیدی کوڕی جوبەیرەوە لەئیبنو عەباسەوە ئەڵێت: ﴿أُعِدَّتۡ﴾ واتە: بۆئەوکەسانەی وەك ئێوە بوە لە خوانەناسیدا[1].

### بێگومان جەهەنەم ئێستا هەیە و ئامادەیە

زۆرێك لە زانایان و پێشەوایانی فەرموودە ئەم ئایەتەیان کردوەتە بەڵگە لەسەر ئەوە کە ئاگری جەهەنەم ئامادەکراوە. وەك خودای گەورە ئەفەرموێت: ﴿أُعِدَّتۡ﴾ واتە: ئامادەکراوەو سازدراوە. فەرمودەی زۆر لەو بارەیەوە هاتووە لە وانە: بەهەشت و جەهەنەم مشت و مڕیان بوو[2]. وە لەو فەرمودانە: ئاگر داوای ئیزنی کرد لە پەروەردگاری و وتی: پەروەردگارم هەندێکم هەندێکی ترمی خوارد، خودای گەورە ئیزنی دا بە دوو هەناسەدان، هەناسەیەك لە زستاندا و هەناسەیەکیش لە هاویندا[3]. وە فەرمودەکەی ئیبنو مەسعود گوێمان لە گرمەیەك بوو، وتمان ئەو چیە؟ پێغەمبەری خودا( ﷺ ) فەرمووی: ئەوە بەردێك بوو فڕێ درا لە کەناری جەهەنەمەوە حەفتا ساڵە ئێستا گەیشتە بنەکەی[4]. ئەم فەرمودە لە موسلیمەوە وەرگیراوە. فەرمودەکەی خۆرگیران و شەوی ئیسرا و چەندین فەرمودەی تریش کە بە تەواوی هاتووە لە مانایەدا.

﴿وَبَشِّرِ ٱلَّذِينَ ءَامَنُواْ وَعَمِلُواْ ٱلصَّٰلِحَٰتِ أَنَّ لَهُمۡ جَنَّٰتٖ تَجۡرِي مِن تَحۡتِهَا ٱلۡأَنۡهَٰرُۖ كُلَّمَا رُزِقُواْ مِنۡهَا مِن ثَمَرَةٖ رِّزۡقٗا قَالُواْ هَٰذَا ٱلَّذِي رُزِقۡنَا مِن قَبۡلُۖ وَأُتُواْ بِهِۦ مُتَشَٰبِهٗاۖ وَلَهُمۡ فِيهَآ أَزۡوَٰجٞ مُّطَهَّرَةٞۖ وَهُمۡ فِيهَا خَٰلِدُونَ ٢٥﴾

[1] الطبری /١/٣٥٣ ص٤٥.
[2] مسلم /٤/٢١٨٦.
[3] البخاری /٥٣٧/، تحفة الاحوذی/٧/٣١٧.
[4] مسلم /٤/٢١٨٤ ص٤٥.

## پاداشتی خاوەن باوەڕ ئاکار چاکەکانیش

خودای گەورەئەفەرموێت: ﴿وَبَشِّرِ ٱلَّذِينَ ءَامَنُواْ وَعَمِلُواْ ٱلصَّٰلِحَٰتِ أَنَّ لَهُمْ جَنَّٰتٍ تَجْرِى مِن تَحْتِهَا ٱلْأَنْهَٰرُ﴾ بەو کەسانەی خاوەنباوەڕو ئاکار چاکن مژدە بدە، باغاتێکی وایان دەبێ جۆباریان بەبەردا دەڕوات، دوای ئەوەی خودای گەورەباسی ئەو سزایەی کرد کە سازی داوە بۆ دوژمنانی لەو خوانەناسە بەدبەختانەی کە بڕوایان نیەبە خوداو پێغەمبەرانی کە سزای سەخت و گرانە. دێتە سەر ژیانی دۆستانی لەو خاوەنباوەڕە بەختەوەرانەکە بڕوایان هەیە بە خودا و پێغەمبەرانی و بە کرداری چاکیشیان سەلماندیان خاوەنباوەڕن. ئەمە مانای ناو هێنانی قورئانە بە دووبارە کراوە، بە پێی ڕاست ترین قسەی زانایان، وەك لە شوێنی خۆیدا باسی دەکەین، خودای گەورە کە باسی باوەڕ دەکا بە دوایدا باسی خواناسانیش دەکا و بە پێچەوانەشەوە. یان باسی ژیانی بەختەوەران دەکا بە دوایدا باسی بەدبەختانیش دەکا و بە پێچەوانەشەوە. بە کورتی باسی شتێکی کردووە بەرانبەرەکەیشی هێناوە. بەڵام باسی شتێك و هاو وێنەکەی، ئەوە لەیەك چوونی پێدەوترێ، وەك بەو زوانە بەویستی خوای مەزن ڕوونی دەکەینەوە. هەربۆیە خودای گەورە ئەفەرموێت: ﴿وَبَشِّرِ ٱلَّذِينَ ءَامَنُواْ وَعَمِلُواْ ٱلصَّٰلِحَٰتِ أَنَّ لَهُمْ جَنَّٰتٍ تَجْرِى مِن تَحْتِهَا ٱلْأَنْهَٰرُ﴾ ئەو کەسانەی کە خاوەنباوەڕوو ئاکار چاکن مژدە بدە باغێکی وایان دەبێ جۆباریان بەبەردا دڕوا ڕوبارەکانی بەهەشت لە کەندڕو چاڵەوە ناڕوا، لە کەوسەرەوە (الكوثر) دەردەچێ لە کەنارەکەیدا گومەزی مرواری بۆشی تێدایە و جیاوازی لە نێوانیاندا نیە، قوڕەکەی میسکێکی زۆر بۆن خۆشە، بەردەکانیشی لە مرواری و گەوهەرە. داواکارین لە خودا بە فەزڵی خۆی بێبەشمان نەکا. بێگومان خودا بەخشندە و دلۆڤانە. ئیبنو ئەبی حاتەم ڕیوایەتی کردووە لە ئەبو هەرەیرەوەئەڵێت: پێغەمبەری خودا (ﷺ) ئەفەرموێت: ڕوبارەکانی بەهەشت لە ژێر تەپۆڵکەکانەوە هەڵدەقوڵێ، یان لە ژێر کێوە میسکەکانەوە[1]. دیسان ڕیوایەتی کردووە لە مەسروقەوە ئەڵێت: ڕووبارەکانی بەهەشت لە ژێر کێوی میسکەوە هەڵدەقوڵێ[2].

## میوەکانی بەهەشت لەیەك دەچن

خودای گەورە ئەفەرموێت: ﴿كُلَّمَا رُزِقُواْ مِنْهَا مِن ثَمَرَةٍ رِّزْقًا قَالُواْ هَٰذَا ٱلَّذِى رُزِقْنَا مِن قَبْلُ﴾ هەرمیوەیەك بچێژن، دەڵێن: ئەمە ئەوەیە کەلەمەو پێش پێمان درا. ئیبنو ئەبی حاتەم ڕیوایەتی کردووە لە یەحیای کوڕی ئەبو کەسیرەوە ئەڵێت: گژو گیای بەهەشت زەعفەرانە، تەپۆڵکە لمەکانی

---

[1] ابن ابی حاتم /١/٨٧ ص٤٦.

[2] ابن ابی حاتم /١/٨٨.

میسکە، مندالآن بەسەریا دەگەڕێن بە میوەوە لێی دەخۆن، پاشان هەر بەوێنەی ئەو میوانەیان بۆ دێنن، خەڵکی بەهەشت پێیان دەڵێن: ئەمەی کە هێناوتانە، لەمەو پێش هەر لەمەتان هێنا، مندالّەکان پێیان دەڵێن: فرموو بخۆن ڕەنگی وەك یەکە بەلآم تامیان جیاوازە. ئەمە ئەوەیە کە خودای گەورە ئەفەرموێت: ﴿وَأُتُواْ بِهِۦ مُتَشَٰبِهًا﴾ ئێستا وێنەیان هێناوە[١]. ئەبو جەعفەری ڕازی ئەڵێت: لە ڕەبیعی کوڕی ئەنەسەوە لە ئەبولعالیەوە ﴿وَأُتُواْ بِهِۦ مُتَشَٰبِهًا﴾ وتی: لەیەکتری دەچوون بەڵام لە تامدا جیاواز بوون[٢]. عیکرەمە ئەڵێت: ﴿وَأُتُواْ بِهِۦ مُتَشَٰبِهًا﴾ لە میوەی دنیا دەچێ بەلآم میوەی بەهەشت چاکترو بەتام ترە[٣]. سوفیانی سەفەوی لە ئەعمەشەوە لە ئەبو زیبیانەوە لە ئیبنو عەباسەوە ئەڵێت: ئەوەی لە بەهەشتایە هیچی لەوە ناچێ لە دنیادایە، تەنیا لە ناوەکانیاندا نەبێ. وە لە ڕیوایەتێکی ترا هاتووە: لە دنیادا هیچ شتێك نیە لەوەی لە بەهەشتا هەیە جگە لە ناوەکانی[٤].

## ژنانی خەڵکی بەهەشت پاك و خاوێنن

خودای گەورە ئەفەرموێت: ﴿وَلَهُمۡ فِيهَآ أَزۡوَٰجٞ مُّطَهَّرَةٞۖ﴾ ژنەکانیان لەوێ زۆر پاك و خاوێنن، ئیبنو ئەبی تەلحە لە ئیبنو عەباسەوە ئەڵێت: پاك و خاوێنە لە پیسی و چەپەڵی و ئازار[٥]. موجاهید ئەڵێت: لە حەیز و میزو پیسی و چڵم و بەڵغەم و مەنی و منداڵ بوون[٦]. قەتادە ئەڵێت: پاك و خاوێنن لە ئازار و تاوان، وە لە ڕیوایەتێکی ترا هەر لە قەتادەوە هاتووە: دورن لە حەیز و ناڕەحەتیەوە[٧]. وە ڕیوایەت کراوە لە عەتا و حەسەن و زەححاك و ئەبو سالح و عەتیە و سوددی و هەر بەو جۆرە[٨]. پاشان خودای گەورە ئەفەرموێت: ﴿وَهُمۡ فِيهَا خَٰلِدُونَ﴾ تا هەتایە هەر لەبەهەشتا دەمێنن، ئەمە ئیتر ئەوپەڕی بەختەوەریە، ئەمانە لەم هەموو بەهرەیەدا لە شوێنێکان دڵنیان کە هەرگیز نامرن و هەر دەمێنن و هەرگیز دوایی نایەت و کۆتایی نایەت، بەڵکو بەردەوام هەر لە خۆشی و بەختەریدان کە هەرگیز

---

[١] ابن ابی حاتم /١/٩٠ ص٤٦.
[٢] ابن ابی حاتم /١/٩٠.
[٣] الطبری /١/٣٩١.
[٤] الطبری /١/٣٩٢.
[٥] الطبری /١/٣٩٥.
[٦] الطبری /١/٣٩٦.
[٧] ابن ابی حاتم /١/٩١.
[٨] ابن ابی حاتم /١/٩٢.

نابڕێتەوە. داوامان وایە لە خودا لەگەڵ ئەوانەدا کۆمان بکاتەوە، چونکە خودای مەزن زۆر بەخشندە و ڕێزدارو دلۆڤان و دەهەندەیە.

﴿ إِنَّ ٱللَّهَ لَا يَسْتَحْيِۦٓ أَن يَضْرِبَ مَثَلًا مَّا بَعُوضَةً فَمَا فَوْقَهَا ۚ فَأَمَّا ٱلَّذِينَ ءَامَنُوا۟ فَيَعْلَمُونَ أَنَّهُ ٱلْحَقُّ مِن رَّبِّهِمْ ۖ وَأَمَّا ٱلَّذِينَ كَفَرُوا۟ فَيَقُولُونَ مَاذَآ أَرَادَ ٱللَّهُ بِهَـٰذَا مَثَلًا ۘ يُضِلُّ بِهِۦ كَثِيرًا وَيَهْدِى بِهِۦ كَثِيرًا ۚ وَمَا يُضِلُّ بِهِۦٓ إِلَّا ٱلْفَـٰسِقِينَ ﴿٢٦﴾ ٱلَّذِينَ يَنقُضُونَ عَهْدَ ٱللَّهِ مِنۢ بَعْدِ مِيثَـٰقِهِۦ وَيَقْطَعُونَ مَآ أَمَرَ ٱللَّهُ بِهِۦٓ أَن يُوصَلَ وَيُفْسِدُونَ فِى ٱلْأَرْضِ ۚ أُو۟لَـٰٓئِكَ هُمُ ٱلْخَـٰسِرُونَ ﴿٢٧﴾ ﴾

خودای گەورە ئەفەرموێت: ﴿إِنَّ ٱللَّهَ لَا يَسْتَحْيِۦٓ أَن يَضْرِبَ مَثَلًا مَّا بَعُوضَةً فَمَا فَوْقَهَا﴾ خودا لەوە شەرم ناکا لە مێشوولە کەمتر بە نمونە بهێنێتەوە. سوددی لە تەفسیرەکەیا ڕیوایەتی کردووە لە ئیبنو عەباس و ئیبنو مەسعودو هەندێ لە هاوەڵەکانی پێغەمبەرەوە (ﷺ) کاتێ خودای گەورە ئەم دوو نمونەی هێنایەوە: ﴿مَثَلُهُمْ كَمَثَلِ ٱلَّذِى ٱسْتَوْقَدَ نَارًا﴾ ئەمانە ڕاستن وێنەیان وەك کەسێك وایە: لە شەوێکی تاریکا ئاگرێك هەڵگیرسێنن. وە ئەفەرموێت: ﴿ أَوْ كَصَيِّبٍ مِّنَ ٱلسَّمَآءِ ﴾ یان: وەك کەسانێ کە بارانێکی بە تەوژم لە ئاسمانەوە. واتە: ئەم سێ ئایەتە. دووڕووەکان وتیان: خودا زۆر بەرز و بڵند ترە لەوە کە ئەم نمونانە بێنێتەوە، خودای گەورە ئەم ئایەتەی ناردە خوارەوە تا دەگاتە ﴿هُمُ ٱلْخَـٰسِرُونَ﴾ هەر خۆیان زیان بار دەبن. سەعید لە قەتادەوە ئەڵێت: واتە: خودا شەرم ناکا لەباسی شتێ کە هەق بێ، بائەو شتە بچوك بێت یان گەورە کە خودای گەورە کاتێ لە کتێبەکەیدا باسی مێشولە و جاڵجاڵۆکە دەکا، ئەو کەسانەی کە گومڕان دەڵێن: خودا مەبەستی چیە لە باسی ئەمانە؟خودای گەورە ئەم ئایەتەی ناردە خوارەوە کە ئەفەرموێت: ﴿إِنَّ ٱللَّهَ لَا يَسْتَحْيِۦٓ أَن يَضْرِبَ مَثَلًا مَّا بَعُوضَةً فَمَا فَوْقَهَا﴾[1] بێگومان خودا شەرم ناکا لە مێشولە کەمتر بە نمونە بهێنێتەوە.

### نمونەیەك بۆ دنیا

ئەبو جەعفەری ڕازی لە ڕەبیعی کوڕی ئەنەسەوە لەم ئایەتەدا ئەڵێت: ئەمە نمونەیەکە خودا هێناویەتیەوە بۆ دنیا چونکە مێشولە تا برسی بێ دەژی و دەمێنێ،کاتێ کە قەڵەو بوو دەمرێ، هەروەها ئەو کەسانەش کە خودا ئەم نمونانەی لەسەر هێناونەتەوە لە قورئاندا کاتێ لە دنیا تێریان خوارد وبێنیاز بوون لەو کاتەدا خوای گەورە دەیان گرێ و لەناویان دەبات. پاشان ئەم ئایەتەی

[1] الطبری /١/٣٩٩.

خوێندەوە: ﴿فَلَمَّا نَسُوا۟ مَا ذُكِّرُوا۟ بِهِۦ فَتَحْنَا عَلَيْهِمْ أَبْوَٰبَ كُلِّ شَىْءٍ﴾[١] جا کاتێ ئەو هەموو ئامۆژگاریانەیان کە کرابوون لە بیر چوو، هەموو دەرگای بەختەوەریمان بۆ کردنەوە[٢]. مانای ئایەتەکە ئەوەیە کە خودا فەرمویەتی کە شەرم ناکا واتە: پێی خراپ نیە. وە وتراوە: ناترسێ هەر نمونەیەک بێنێتەوە، بەهەر شێوەیەک بێت، ئەو نمونەیە بچوک بێت یان گەورە. وە ئەفەرموێت: ﴿فَمَا فَوْقَهَا﴾ واتە: لە مێشوولە گەورەتریش بێت. چونکە هیچ شتێ لە مێشوولە سووک و بێنرخ و بچوکتر نیە. موسلیم ڕیوایەتی کردووە لە عایشەوە ڕەزای خوای لێبێ کە پێغەمبەری خودا(ﷺ) ئەفەرموێت: هیچ مسوڵمانێ نیە کە دڕکێ یان کەمتر لە دڕکێ بچێ پێیدا مەگین بەوە پایە و پلەیەکی بۆ نوسراوە و تاوانێکی لێ سڕاوەتەوە بەوە[٣]. فەرمویەتی هیچ شتێ بە کەم سەیر ناکرێ کە نمونەی پێ بهێنرێتەوە، با ئەو شتە ئەوەندە بێنرخ و بچوکیش بێت وەک مێشولە، وەک چۆن پێی شەرم نەبووە دروستی کردووە، هەر بەوجۆرەیش پێی شەرم نیە نمونەی پێ بێنێتەوە. وەک چۆن نمونەی بە مێشولە و جاڵجاڵۆکە هێناوەتەوەو ئەفەرموێت: ﴿يَٰٓأَيُّهَا ٱلنَّاسُ ضُرِبَ مَثَلٌ فَٱسْتَمِعُوا۟ لَهُۥٓ ۚ إِنَّ ٱلَّذِينَ تَدْعُونَ مِن دُونِ ٱللَّهِ لَن يَخْلُقُوا۟ ذُبَابًا وَلَوِ ٱجْتَمَعُوا۟ لَهُۥ ۖ وَإِن يَسْلُبْهُمُ ٱلذُّبَابُ شَيْـًٔا لَّا يَسْتَنقِذُوهُ مِنْهُ ۚ ضَعُفَ ٱلطَّالِبُ وَٱلْمَطْلُوبُ﴾[٤] ئەی خەڵکینە !نمونەیەک هێنراوەتەوە گوێی بۆ بگرن: جگە لە خودا ئەوانەی هانای پێ دەبەن، ئەگەر هەموویان کۆ ببنەوە، ناتوانن مێشێ دروست بکەن، ئەگەر مێشیش شتێکیان لێبسەنێ ناتوانن لێی وەربگرنەوە داوە کەر و داوا کراو چەندە زەبوونن. وە ئەفەرموێت: ﴿مَثَلُ ٱلَّذِينَ ٱتَّخَذُوا۟ مِن دُونِ ٱللَّهِ أَوْلِيَآءَ كَمَثَلِ ٱلْعَنكَبُوتِ ٱتَّخَذَتْ بَيْتًا ۖ وَإِنَّ أَوْهَنَ ٱلْبُيُوتِ لَبَيْتُ ٱلْعَنكَبُوتِ ۖ لَوْ كَانُوا۟ يَعْلَمُونَ﴾[٥] ئەو کەسانەی جگە لە خودا چەند دۆستێکیان بۆ خۆیان پەیدا کردووە ئەگەر بزانن وەک جاڵجاڵۆکە یان کاکڵە مێشان بەسەر هاتووە. کە خانوی بۆ خۆی تەنیوە، دیارە خانوی کاکڵە مێشان لە هەموو کالانێ لاواز ترە. بۆیە ئەفەرموێت: ﴿أَلَمْ تَرَ كَيْفَ ضَرَبَ ٱللَّهُ مَثَلًا كَلِمَةً طَيِّبَةً كَشَجَرَةٍ طَيِّبَةٍ أَصْلُهَا ثَابِتٌ وَفَرْعُهَا فِى ٱلسَّمَآءِ ﴿٢٤﴾ تُؤْتِىٓ أُكُلَهَا كُلَّ حِينٍۭ بِإِذْنِ رَبِّهَا ۗ وَيَضْرِبُ ٱللَّهُ

---

[١]- الانعام ٤٤

[٢]- الطبری /١/٣٩٨

[٣]- مسلم /٤/١٩٩١ ص٤٧

[٤]- الحج ٧٣

[٥] العنكبوت ٤١.

ٱلۡأَمۡثَالَ لِلنَّاسِ لَعَلَّهُمۡ يَتَذَكَّرُونَ ﴿٢٥﴾ وَمَثَلُ كَلِمَةٍ خَبِيثَةٍ كَشَجَرَةٍ خَبِيثَةٍ ٱجۡتُثَّتۡ مِن فَوۡقِ ٱلۡأَرۡضِ مَا لَهَا مِن قَرَارٍ ﴿٢٦﴾ يُثَبِّتُ ٱللَّهُ ٱلَّذِينَ ءَامَنُواْ بِٱلۡقَوۡلِ ٱلثَّابِتِ فِي ٱلۡحَيَوٰةِ ٱلدُّنۡيَا وَفِي ٱلۡأٓخِرَةِۖ وَيُضِلُّ ٱللَّهُ ٱلظَّٰلِمِينَۚ وَيَفۡعَلُ ٱللَّهُ مَا يَشَآءُ﴾[1] ئەد دی خودا چۆن نمونە دێنێتەوە؟ قسەیەکی بەپێ و جێ، بەشەنگە دارێك دەهێنێتەوە، ڕەگی قایم داکوتاوە و لقەکانیشی بەرز بوبێتەوە بە ئاسماندا. بە ئیزنی ڕاهێنەرەکەی خۆی چوار فەسڵە میوەی دەبێ. خودا نمونەکان بۆ ئەو خەڵکە دێنێتەوە، بەڵکو پەندی لێوەرگرن. نموونەی قسەی نا بەجێش، وەك ڕەگێکی ناجسنە، کە لەزەمین هەڵکەنرابێ و هەر خۆی نەگرێ. خودا لە دونیا و لە قیامەتدا، بە قسەی پتەو بڕواداران قایم دەکاتەوە، ناهەقی کارانیش لە ڕێگە لا ئەدا، خودا چۆنی بوێ دەیکا. وە ئەفەرموێت: ﴿ضَرَبَ ٱللَّهُ مَثَلًا عَبۡدًا مَّمۡلُوكًا لَّا يَقۡدِرُ عَلَىٰ شَيۡءٍ﴾[2] خودا نموونەیەك دەهێنێتەوە: بەندەیەك هەیە هیچ کارێکی لە دەست نایە. پاشان ئەفەرموێت: ﴿ وَضَرَبَ ٱللَّهُ مَثَلًا رَّجُلَيۡنِ أَحَدُهُمَآ أَبۡكَمُ لَا يَقۡدِرُ عَلَىٰ شَيۡءٍ وَهُوَ كَلٌّ عَلَىٰ مَوۡلَىٰهُ أَيۡنَمَا يُوَجِّههُّ لَا يَأۡتِ بِخَيۡرٍ هَلۡ يَسۡتَوِي هُوَ وَمَن يَأۡمُرُ بِٱلۡعَدۡلِ﴾[3] ئەمەیش بە نموونە دێنێ: دوو مرۆڤ هەن یەکێکیان لاڵە و هیچ کارێکی پێ ناکرێ سەرباری خاوەنەکەی خۆیەتی و بۆ هەرکوێیەکی بنێرێ هیچ بەهرە ناهێنێتەوە لەگەڵ ئەو کەسەی ئەو کەسەی فەرمان بۆ یەکسانی ئەدات چۆن وەك یەکن؟ وەك ئەفەرموێت: ﴿ ضَرَبَ لَكُم مَّثَلًا مِّنۡ أَنفُسِكُمۡۖ هَل لَّكُم مِّن مَّا مَلَكَتۡ أَيۡمَٰنُكُم مِّن شُرَكَآءَ فِي مَا رَزَقۡنَٰكُمۡ﴾[4] نمونەیەکی لە خۆتان بۆ هێناونەتەوە، ئایە ئێوە لەو بژێوەی لە ئێمەوە بۆتان هاتووە، بەندەێکتان دەکەنە هاوبەشی خۆتان؟ موجاهید ئەڵێت: لەم ئایەتەدا کە خوای گەورە ئەفەرموێت: ﴿إِنَّ ٱللَّهَ لَا يَسۡتَحۡيِۦٓ أَن يَضۡرِبَ مَثَلًا مَّا بَعُوضَةً فَمَا فَوۡقَهَا﴾ خودا لەوە شەرم ناکا لە مێشولە کەمتر بە نمونە بێنێتەوە هەر نمونەیەك گەورە بێت یان بچوك خاوەنباوەڕان بڕوایان پێی هەیە و چاکیش دەزانن کە ڕاستە و لەلایەن پەروەردگاریان هاتووە و بەهۆی ئەو نمونانەوە شارەزایان دەکا[5]. پاشان خودای گەورە ئەفەرموێت: ﴿فَأَمَّا ٱلَّذِينَ ءَامَنُواْ فَيَعۡلَمُونَ أَنَّهُ ٱلۡحَقُّ مِن رَّبِّهِمۡۖ وَأَمَّا

---

[1] إبراهيم ٢٤-٢٧.

[2] النحل ٧٥.

[3] النحل ٧٦.

[4] الروم ٢٨.

[5] ابن ابی حاتم /٩٣/١ ص٤٧.

ٱلَّذِينَ كَفَرُواْ فَيَقُولُونَ مَاذَآ أَرَادَ ٱللَّهُ بِهَٰذَا مَثَلٗاۘ يُضِلُّ بِهِۦ كَثِيرٗا وَيَهۡدِي بِهِۦ كَثِيرٗاۚ ﴾ جا ئەوانەی باوەڕدارن ڕوون دەزانن کە ئەمە ڕاستە و لە پەروەردگاریانەوەیە، ئەوانەی خوا نەناسن، دەڵێن: خودا لەم نمونە هێنانەوە چی ویستووە؟ زۆری پێ گومڕا دەکا و زۆریشیان شارەزا دەکا. سوددی لە تەفسیرەکەیدا ڕیوایەتی کردووە لە ئیبنو عەباس و ئیبنو مەسعود و هەندێ لەهاوەڵکانی پێغەمبەرەوە(ﷺ): ﴿يُضِلُّ بِهِۦ كَثِيرٗا وَيَهۡدِي بِهِۦ كَثِيرٗاۚ ﴾ زۆری پێ گومڕا دەکا. مەبەست پێی دووڕووەکانە و بڕوادارانی پێ شارەزا دەکا. ئەو دووڕووانە گومڕاییەکەیان زیاد دەکا بە هۆی ئەو ڕاستیەوە کە شارەزای بوون. ئەو نمونەی کە خودا بۆی هێناونەتەوە، چوونکە ئەو نمونەیە لەواندا هاتۆتە دی و خودا بەو نمونەیە گومڕای کردوون[1]. ﴿وَيَهۡدِي بِهِۦ كَثِيرٗاۚ ﴾ زۆریش بەو نمونەیە شارەزا دەکا وە خەڵکی خاوەنباوەڕو بڕوا پتەو زیاتر شارەزا دەبن و بڕوایان بە هێز تر دەبێ بە هۆی ئەو بڕواوەوە کە بوویانە و ئەو نمونانەی بۆی هێناونەتەوە: ﴿وَمَا يُضِلُّ بِهِۦٓ إِلَّا ٱلۡفَٰسِقِينَ ﴾ هەر ئەوانە پێی توشی گومڕایی دەبن کە لە ڕێگە لا ئەدەن. وتی: ئەوانە دووڕووەکانن. عەرەب دەڵێ: (خست الرطبة) کاتێ لە توێکڵەکەی خۆی هاتە دەرەوە، هەر بۆیە بە مشك دەوترێ لەڕێ لادەر کاتێ لە کونەکەی خۆی هاتە دەرەوە بۆ بەدکاری. لەهەردوو سەحیحەکەدا هاتووە لە عایشەوە ڕەزای خوای لێبێ کە پێغەمبەری خودا فەرمویەتی: پێنج گیانەوەری زیان بەخش هەیە لەکاتی ئاسایی و لە کاتی ئیحرامیشا دەکوژرێن: قەلەڕەش و کۆلارە( واشە) دووپشك و مشك و سەگی هار[2]. خراپە کار (الفاسق) خوانەناس و لاسار و یاخیش دەگرێتەوە، بەڵام لاساری خوانەناس زۆر خراپتر و چەپەڵ ترە، مەبەست بە لاسار (الفاسق) لێرەدا خوانەناسە والله أعلم، بەو نیشانەی کە خوای گەورە باسی کردوون و ئەفەرموێت: ﴿ٱلَّذِينَ يَنقُضُونَ عَهۡدَ ٱللَّهِ مِنۢ بَعۡدِ مِيثَٰقِهِۦ وَيَقۡطَعُونَ مَآ أَمَرَ ٱللَّهُ بِهِۦٓ أَن يُوصَلَ وَيُفۡسِدُونَ فِي ٱلۡأَرۡضِۚ أُوْلَٰٓئِكَ هُمُ ٱلۡخَٰسِرُونَ ﴾ ئەوکەسانەی پەیمان لەگەڵ خودا دەبەستن و دەیشکێنن، ئەو شتەی خودا ویستویە بە ساغی بیهێڵێتەوە دەیبڕن ودەپسێنن لە زەویدا بەد فەڕی دەکەن هەر خۆیان زیان بار دەبن. ئەم سیفەتانە سیفەتی خوانەناسن و دوورە لە سیفەتی خاوەنباوەڕانەوە. وەك خودای گەورە لە سوورەتی ڕەعدا ئەفەرموێت: ﴿أَفَمَن يَعۡلَمُ أَنَّمَآ أُنزِلَ إِلَيۡكَ مِن رَّبِّكَ ٱلۡحَقُّ كَمَنۡ هُوَ أَعۡمَىٰٓۚ إِنَّمَا يَتَذَكَّرُ أُوْلُواْ ٱلۡأَلۡبَٰبِ (١٩) ٱلَّذِينَ يُوفُونَ بِعَهۡدِ ٱللَّهِ وَلَا يَنقُضُونَ ٱلۡمِيثَٰقَ (٢٠) وَٱلَّذِينَ يَصِلُونَ مَآ أَمَرَ ٱللَّهُ بِهِۦٓ أَن يُوصَلَ وَيَخۡشَوۡنَ رَبَّهُمۡ وَيَخَافُونَ

---

[1] الطبری /۱/۴۰۸.

[2] فتح الباری /۶/۴۰۸ /، مسلم/۲/۸۵۶ ص۴۷.

سُوٓءَ ٱلۡحِسَابِ﴾[1] ئایە كەسێ بڕوای وابێ ئەوەی لە پەروەردگارتەوە بۆ تۆ هاتۆتە خوارەوە هەموو ڕاستە وەك ئەوەیە كە كوت و كوێرە؟ ئەم ڕامانە هەر بۆ خاوەنباوەڕانە. ئەو كەسانەی پەیمانی خوا پێك دێنن و ئیتر لێی پاشگەز نابنەوە. ئەو كەسانەش كە پەیوەندی نێوانی خۆیان لەگەڵ خودا وەك خودا فەرمانی داوە پەیوەست بكرێ وەك بەسەر كردنەوەی خزمان و لە پەروەردگاریان دەترسن و لەسەختی لێپرسینەوە نیگەرانن. تا دەگاتە: ﴿وَٱلَّذِينَ يَنقُضُونَ عَهۡدَ ٱللَّهِ مِنۢ بَعۡدِ مِيثَٰقِهِۦ وَيَقۡطَعُونَ مَآ أَمَرَ ٱللَّهُ بِهِۦٓ أَن يُوصَلَ وَيُفۡسِدُونَ فِي ٱلۡأَرۡضِ أُوْلَٰٓئِكَ لَهُمُ ٱللَّعۡنَةُ وَلَهُمۡ سُوٓءُ ٱلدَّارِ﴾[2] ئەو كەسانە كە پەیمانیاندا بە خودا و لەپاشان پاشگەز بوونەوەو پەیوەندی نێوان خۆیان و خودایان بڕی وپسان كە خۆی فەرمانی پێدابوون نەی پسێنن وە لە زەویدا بەدفەڕی دەكەن، لەبەهرەی خودا بێبەشن و دواڕۆژی دژواریان هەیە. ئەو پەیمانەی كە دووڕوەكان پاشگەزبوونەوە لێی و باسكرا، ئەوە وەسیەتەی خودای گەورە بوو بۆ ئەو خەڵكە كە فەرمانی پێدابوون گوێڕایەڵی فەرمانەكانی بن و لێی قەدەغە كردبوون كە سەرپێچی بكەن لە كتێبەكانیدا و لەسەر زمانی پێغەمبەرەكانی، كەچی پاشگەز بوونەوە لێی و كاریان پێنەكرد. وتراویشە: ئەمە دەربارەی ئەو خوانەناسی ئەهلی كتێب و دووڕوانەیە، ئەو پەیمانەی كە ئەهلی كتێب پاشگەز بوونەوە لێی، ئەم پەیمانە بوو كە خودا وەری گرتبوو لێیان كە پێی هەڵسن لە تەوراتا و شوێن كەوتنی مەحەمەد(ﷺ) كاتێ كە ڕەوانە كراو بڕوا هێنان بەوەی كی لەلایەن پەروەردگاریانەوە پێی دێت. شكاندنی ئەو پەیمانە و بڕوا پێنەكردنی دوای شارەزابونیان بە ڕاستیەكەی و حاشا كردنیان لێی و شاردنەوەی ئەو زانیاریە لە خەڵكی پاش بەڵێن دانیان بە خودا كە نەیشارنەوە لێیان و بۆیان ڕوون بكەنەوە، خودای گەورە ئەفەرموێت: كە ئەو بەڵێنەیان پشت گوێ خستوەو بە نرخێكی كەم فرۆشتویانە. وە وتراوە: مەبەست بەم ئایەتە هەموو خوانەناس و بتپەرست و دووڕوییەكە. وە بەڵێنی لە هەموویان وەرگرتووەكە بەتەنیا خوا بپەرستن بە پێی ئەوەی بۆی داناون لەو بەڵگانەی كە نیشانەن لەسەر پەروەردگاری خوداو پەیمانی لێوەرگرتون كە بەرفەرمان بن دووركەونەوە لە قەدەغەكراوەكانی و موعجیزەی دا بە پێغەمبەرەكانی كە نیشانە بێ لەسەر پێغەمبەرایەتیان كە هیچ كەسێ ناتوانێ لە جۆری ئەو موعجیزانە بێنێ جگە لەوان، ئەو خوانەناس و بتپەرست و دووڕوانە پاشگەز بوونەوە لەو بەڵێنە و بڕوایان نەكرد بەو پێغەمبەرانە و بە كتێبەكانیش كە چاك دەیان زانی ئەوەی كە ئەوان هێناویانە هەقە. هەر بەم شێوەیە ڕیوایەت كراوە لە موقاتیلەوە زەمەخشەریش هەروای وتووە. پاشان خودای گەورە ئەفەرموێت: ﴿وَيَقۡطَعُونَ مَآ أَمَرَ ٱللَّهُ بِهِۦٓ أَن يُوصَلَ وَيُفۡسِدُونَ فِي ٱلۡأَرۡضِ﴾ وە ئەو شتانەی خوا

---

[1] الرعد ١٩-٢١.

[2] الرعد ٢٥.

فەرمانی داوە بە پەیوەست کردن دەیپچڕێنن و لە زەویدا بەدفەڕی دەکەن. وتراوە: مەبەست پێی پەیوەندی خزمایەتیە. وەك قەتادە تەفسیری کردووە و ئەم ئایەتەش ئەفەرموێت: ﴿ فَهَلْ عَسَيْتُمْ إِن تَوَلَّيْتُمْ أَن تُفْسِدُوا فِي الْأَرْضِ وَتُقَطِّعُوا أَرْحَامَكُمْ ﴾[1] ئایە ئەگەر دەسەلاتتان کەوتە دەست،لەم زەمینە خراپە دەکەن و پەیوەندی خزمایەتیتان دەپچڕێنن. ئیبنو جەریریش هەر وای وتوە. وتراویش: مەبەستەکە لەوە کشتگیرترە،هەچی خودا فەرمانی داوە بە جیٚ ی بێنن و بیکەن ئەوانە پچڕاندویانە و وازیان لیٚ هێناوە.

**مەبەست بە زیان باری**

موقاتیلی کوڕی حەیان وتی لەم دەقەدا کە خودای گەورە: ﴿أُولَٰئِكَ هُمُ الْخَاسِرُونَ﴾ ئەوانە هەر خۆیان زیان بارن. واتە لە ڕۆژی قیامەتدا[2]. ئەمە وەك خودای گەورە ئەفەرموێت: ﴿أُولَٰئِكَ لَهُمُ اللَّعْنَةُ وَلَهُمْ سُوءُ الدَّارِ﴾[3] ئەوانە لە بەهرەی خودا بێبەشن و دوا ڕۆژی دژواریان هەیە. زەححاك لە ئیبنو عەباسەوە ئەلێت: هەرشتیٚ خودای گەورە دایە پالٚ غەیرەز مسوڵمان لەهەر ناویٚ وەك (خاسر) مەبەست پێی خوا نەناسانە. هەچیش دایە پالٚ مسوڵمانان ئەوە مەبەست پێی گوناهە[4]. ئیبنو جەریرئەلێت: لەم دەقەدا: ﴿أُولَٰئِكَ هُمُ الْخَاسِرُونَ﴾ ئەوانە هەر خۆیان زیان بارنكلما ﴿الْخَاسِرُونَ﴾ کۆی (خاسر) ئەو کەسانەن کە خۆیان توشی زیان دەکەن بە گوناه کردن و بیٚ فەرمانی خودا. خۆیان لە بەزەیی خودا دوور دەخەنەوە، وەك کەسیٚ کە لەبازرگانیەکدا تووشی زیان دەبیٚ و لەسەرمایەکەی دەخاتە سەر زیانەکەی لە مامەڵەکەیدا، هەر بەو شێوەیە دووڕو لەگەلٚ خوانەناس تووشی زیان بووە لە بێبەش بوونی لە بەهرەو بەزەیی خودا کە دایناوە بۆ عەبدەکانی لە ڕۆژی قیامەتا کە زۆر پێویستیان بەو بەهرە و بەزەییە هەیە. وەك جەریری کوڕی عەتیە دەڵیٚ:

إن سليطافي الخسار إنه  أولاد قوم خاقوا أقنه[5]

﴿ كَيْفَ تَكْفُرُونَ بِاللَّهِ وَكُنتُمْ أَمْوَاتًا فَأَحْيَاكُمْ ثُمَّ يُمِيتُكُمْ ثُمَّ يُحْيِيكُمْ ثُمَّ إِلَيْهِ تُرْجَعُونَ (٢٨) ﴾

---

[1] محمد ٢٢، الطبری /١/٤١٦ ص٤٨.

[2] ابن ابی حاتم/١/١٠١ ص٤٨.

[3] الرعد ٢٥.

[4] الطبری /١/٤١٧.

[5] الطبری /١/٤١٧.

خودای گەورە ئەفەرموێت: ﴿كَيْفَ تَكْفُرُونَ بِاللَّهِ وَكُنتُمْ أَمْوَاتًا فَأَحْيَاكُمْ ثُمَّ يُمِيتُكُمْ ثُمَّ يُحْيِيكُمْ ثُمَّ إِلَيْهِ تُرْجَعُونَ﴾ چۆن لەو خودایە حاشا دەکەن، کە لە نەبوو، ژیانی داوە بە ئێوە و لەپاشان دەتان مرێنێ و دیسان زیندوتان دەکاتەوە و ئەوسا هەموتان بۆ لای ئەو دەگەڕێنەوە؟ خودای گەورە باسی بوون و دەسەلأت و توانای خۆی دەکا کە هەر خۆی وەدی هێنەر و کاریەدەستی عەبدەکانیەتی، ئەفەرموێت: ﴿كَيْفَ تَكْفُرُونَ بِاللَّهِ﴾ چۆن لەو خودایە حاشا دەکەن و لەگەڵی شتی تر دەپەرستن. ﴿وَكُنتُمْ أَمْوَاتًا فَأَحْيَاكُمْ﴾ کە لە نەبوو ژیانی داوە بە ئێوە. واتە: ئێوە هەر نەبوون خودا ئێوەی هێنایە دنیا. وەك لە ئایەتی ترا ئەفەرموێت: ﴿أَمْ خُلِقُوا مِنْ غَيْرِ شَيْءٍ أَمْ هُمُ الْخَالِقُونَ ﴿٣٥﴾ أَمْ خَلَقُوا السَّمَاوَاتِ وَالْأَرْضَ بَل لَّا يُوقِنُونَ﴾[1] ئایا ئەوان هەر لەنەبوو هاتونەتە دی؟ یان خۆیان خۆیان دروست کرد؟ یان ئەوانن ئاسمانەکان و زەمینیان وەدی هێنا؟ وە ئەفەرموێت: ﴿هَلْ أَتَىٰ عَلَى الْإِنسَانِ حِينٌ مِّنَ الدَّهْرِ لَمْ يَكُن شَيْئًا مَّذْكُورًا﴾[2] بێگومان ماوەیەك لەم ڕۆژگارە بەسەر مرۆڤدا تێپەڕی و ئەو شتێ نبوو باسکراوە. ئایەت لەم بارەیەوە زۆرە. ئیبنو جەریر ئەڵێت: لەعەتاوە لەئیبنو عەباسەوە ئەڵێت: ﴿وَكُنتُمْ أَمْوَاتًا فَأَحْيَاكُمْ﴾ ئێوە بێگیان بوون گیانی بەبەردا کردن. واتە: لە پشتی باب و باپیرانتاندا بێ گیان بوون و هیچ شتێ نەبوون تا کاتێ کە وەدی هێنان. پاشان دەتان مرێنێ بە مردنێکی هەق و دیسان زیندوتان دەکاتەوە لە ڕۆژی قیامەتا. ئەڵێت: وەك ئەو ئایەتە وایە کە ئەفەرموێت: ﴿أَمَتَّنَا اثْنَتَيْنِ وَأَحْيَيْتَنَا اثْنَتَيْنِ﴾[3] دووجار مراندوتین دووجاریش ژیانت بەبەردا کردووین.

﴿هُوَ الَّذِي خَلَقَ لَكُم مَّا فِي الْأَرْضِ جَمِيعًا ثُمَّ اسْتَوَىٰ إِلَى السَّمَاءِ فَسَوَّاهُنَّ سَبْعَ سَمَاوَاتٍ ۚ وَهُوَ بِكُلِّ شَيْءٍ عَلِيمٌ ﴿٢٩﴾﴾

### باسی نیشانەکانی دەسەلأتی خودا

دوای ئەوەی کە خودای گەورە باسی ئەو نیشانانەی کرد لەبارەی وەدی هێنانیانەوە کە بەچاوی خۆیان هەستی پێدەکەن، نیشانەیەکی تریان بۆ باس دەکا لەوەدی هێنانی ئاسمانەکان و زەمین و ئەفەرموێت: ﴿هُوَ الَّذِي خَلَقَ لَكُم مَّا فِي الْأَرْضِ جَمِيعًا ثُمَّ اسْتَوَىٰ إِلَى السَّمَاءِ فَسَوَّاهُنَّ سَبْعَ سَمَاوَاتٍ﴾

---

[1] الطور ٣٥-٣٦.

[2] الانسان ١.

[3] غافر ١١، الطبرى /١/٤١٩

هەر خۆیەتی هەرچی لە زەمیندا هەیە بۆ ئێوەی دروست کردووە و ئەوسا ڕوی کردە ئاسمان و پاشان ڕێکی خستن بە حەوت ئاسمان. ئاسمان لێرەدا ئیسمی جینسە هەر بۆیە فەرمویەتی: ﴿فَسَوَّىٰهُنَّ سَبْعَ سَمَٰوَٰتٍۚ وَهُوَ بِكُلِّ شَيْءٍ عَلِيمٌ﴾ پاشان ڕێکی خستن بە حەوت ئاسمان، هەر ئەویشە ئاگای لە هەموو شت هەیە. واتە: زانیاری خودا دەوری هەموو شتێکی داوەلە دروستکراوەکانی وەك ئەفەرموێت: ﴿أَلَا يَعْلَمُ مَنْ خَلَقَ﴾ ئایە کەسێ کە دروستی کردووە چۆن نازانێ؟

**سەرەتای وەدی هێنان**

تەفسیری ئەم ئایەتە لەسوورەتی فوسیلەتدا بەدرێژی هاتووە کە خودای گەورە ئەفەرموێت: ﴿قُلْ أَئِنَّكُمْ لَتَكْفُرُونَ بِالَّذِي خَلَقَ الْأَرْضَ فِي يَوْمَيْنِ وَتَجْعَلُونَ لَهُۥٓ أَندَادًاۚ ذَٰلِكَ رَبُّ الْعَٰلَمِينَ ﴿٩﴾ وَجَعَلَ فِيهَا رَوَٰسِيَ مِن فَوْقِهَا وَبَٰرَكَ فِيهَا وَقَدَّرَ فِيهَآ أَقْوَٰتَهَا فِيٓ أَرْبَعَةِ أَيَّامٍ سَوَآءً لِّلسَّآئِلِينَ ﴿١٠﴾ ثُمَّ اسْتَوَىٰٓ إِلَى السَّمَآءِ وَهِيَ دُخَانٌ فَقَالَ لَهَا وَلِلْأَرْضِ ائْتِيَا طَوْعًا أَوْ كَرْهًا قَالَتَآ أَتَيْنَا طَآئِعِينَ ﴿١١﴾ فَقَضَىٰهُنَّ سَبْعَ سَمَٰوَاتٍ فِي يَوْمَيْنِ وَأَوْحَىٰ فِي كُلِّ سَمَآءٍ أَمْرَهَاۚ وَزَيَّنَّا السَّمَآءَ الدُّنْيَا بِمَصَٰبِيحَ وَحِفْظًاۚ ذَٰلِكَ تَقْدِيرُ الْعَزِيزِ الْعَلِيمِ﴾[1] ئایا ئێوە لە کەسێك کە بە دوو ڕۆژ ئەم زەمینەی وەدی هێنا حاشا دەکەن و هاوتای بۆ پەیدا دەکەن؟ ئەوە کە ڕامێنەری هەموو جیهانە. کەژو کێوی لە زەمین بەرز کردەوە و پیتی تێ خستن، هەر لەماوەی چوار ڕۆژدا، بۆ هەرکەسێ بژێوی دەوێ بەیەکسانی بژێوی بۆ دابین کردن. پاشان ڕووی نا لە ئاسمان، کە ئەوسا هەر تاریکایی بوو. بەوان و بەزەمینی فەرموو: خۆش یان ناخۆش، دەبێ بێنە بەر فەرمانم. وتیان: وا بە خۆشی هاتین. ئەوسا کە حەوت ئاسمانی لە دوو ڕۆژدا وەدی هێنا. هەر ئاسمانەی فەرمانی کاری خۆی بۆ نارد، نزیکترین ئاسمانیشیان بە چرا ڕازاندەوەو پاراستمان. خاوەن دەسەلاتی زانا بڕیاری ئەو کارەی داوە. ئەم ئایاتانە بەلگەن لەسەر ئەوە کە خودا یەکەم جار لەسەرەتادا زەوی دروست کردووە، پاشان حەوت ئاسمانکەی وەدی هێناوە، ئێوەی دروستکردنی خانویشی دەبێ لە پێشا بنچینەکەی دەبمەزرێ دوای ئەوە سەرەوەیش دروست بکرێت. زانایانی تەفسیر ئەمەیان وتووە وەك لەمەو بەدوا بە ویستی خودا باسی دەکەین بەلام ئەم ئایەتانی کە خوای گەورە دەفەرموێت: ﴿ءَأَنتُمْ أَشَدُّ خَلْقًا أَمِ السَّمَآءُۚ بَنَىٰهَا ﴿٢٧﴾ رَفَعَ سَمْكَهَا فَسَوَّىٰهَا ﴿٢٨﴾ وَأَغْطَشَ لَيْلَهَا وَأَخْرَجَ ضُحَىٰهَا ﴿٢٩﴾ وَالْأَرْضَ بَعْدَ ذَٰلِكَ دَحَىٰهَآ ﴿٣٠﴾ أَخْرَجَ مِنْهَا مَآءَهَا وَمَرْعَىٰهَا ﴿٣١﴾ وَالْجِبَالَ أَرْسَىٰهَا ﴿٣٢﴾ مَتَٰعًا لَّكُمْ

[1] فصلت ٩-١٢.

﴿وَلِأَنْعَٰمِكُمْ﴾[1] ئایە وەدی هێنانی ئێوە دژوار ترە یان ئەو زەمینەی ئەو دروستی کردووە؟ قەبارەی بەرز کردەوەو لە باریکرد. شەوەکەشی تاریك کردوو چێشتەنگاویشی لێدەرخست، لەپاش ئەوە ئەم زەویەی بە تل دانەوە پان کردەوە، ئاوی لێهێنایە دەرو جێ لەوەڕی لێپەیدا کرد. کێوەکانیشی بە پتەوی لێ دامەزراند. بۆ بەهرە مەندی خۆتان و ئاژەڵتان. وتراوە: کە (ثم) لێرەدا بۆ عەتفی خەبەرە لەسەر خەبەر. نەك عەتفی فعل لەسەر فیعل، عەلی کوڕی ئەبو تەلحە ریوایەتی کردووە لە ئیبنو عەباسەوە[2].

**زەمین لە پێش ئاسمانەکان دروستکراوە**

موجاهید لەم دەقەدا کە خودای گەورە ئەفەرموێت: ﴿هُوَ ٱلَّذِى خَلَقَ لَكُم مَّا فِى ٱلْأَرْضِ جَمِيعًا﴾ هەر خودا خۆیەتی هەرچی لە زەمیندا هەیە، بۆ ئێوەی وەدی هێناوە. وتی: خودا لە پێش ئاسماندا زەمینی دروستکردووە. کاتێ کە زەمینی دروستکرد دووکەڵی لێبەرز بوەوە، ئەویش کاتێ کە ئەفەرموێت: ﴿ثُمَّ ٱسْتَوَىٰٓ إِلَى ٱلسَّمَآءِ وَهِىَ دُخَانٌ﴾[3] پاشان ڕووی نا لە ئاسمان کە ئەوسا هەر تاریکی بوو: ﴿فَسَوَّىٰهُنَّ سَبْعَ سَمَٰوَٰتٍ﴾ پاشان ڕێکی خستن بە حەوت ئاسمان. ئەڵێن: هەندێکیان بەسەر هەنێکیانەوە وە حەوت زەمینیش هەیە. هەندێکی بەسەر هەندێکی تریەوەیە[4]. ئەم ئایەتە بەڵگەیە لە سەر ئەوە کە زەمین لە پێش ئاسمانەوە وەدی هاتووە. وەك لە ئایەتەکانی سوورەتی فوسیلەتدا لە پێشا خودای گەورە فەرمووی. ئەم ئایەتەو ئەو ئایەتانەش بەڵگەن لەسەر ئەوەکە زەمین لە پێش ئاسماندا دروست کراوە.

**تلان و پان بوونەوەی زەمیندوای وەدی هێنانی ئاسمانەکان**

لە سەحیحی بوخاریدا هاتووە لە ئیبنو عەباسەوە کە پرسیاری لێکرا لەم بارەیەوە وتی: بێگومان زەمین دروستکراوە لە پێش ئاسماندا، بەڵام زەمین پان کرایەوە دوای دروست بوونی ئاسمان[5]. وە زۆرێکیش لە زانایانی تەفسیر لە پێشا و تازەیشا هەر وایان وتووە. لە سوورەتی نازیعاتدا باسمان لێکردووە. پوختەکەی ئەوەیە کە پان کرنەوە (الدحی) بەم ئایەتە تەفسیر کراوە کە خوای گەورە ئەفەرموێت: ﴿وَٱلْأَرْضَ بَعْدَ ذَٰلِكَ دَحَىٰهَآ ﴿٣٠﴾ أَخْرَجَ مِنْهَا مَآءَهَا وَمَرْعَىٰهَا ﴿٣١﴾ وَٱلْجِبَالَ أَرْسَىٰهَا﴾[6] پاشان زەوی

---

[1] النازعات ٢٧-٣٢.

[2] الطبری /٤٣٧/١ ص٤٩.

[3] فصلت ١١.

[4] الطبری /٤٣٦/١.

[5] فتح الباری /٤١٧/٨ ص٤٩.

[6] - النازعات ٣٠-٣٢

ڕاخست، ئاوی لێهێنایە دەرو جێ لەوەڕی لێ پەیداکرد، کێوەکانیش بە پتەویی لێی دامەزراند. تەفسیری (الدحی) بەوە کراوە کە هەرچی لەناوی بووە دەرهێنراوە لە هێزەوە بۆ کردار کاتێ کەوێنەی دروستکراوەکانی زەمین و پاشان ئاسمانەکانیش تەواو بوون پاشان زەمینیش ڕاخراو پان کرایەوە، هەرچی لەناویدا بوو هاتە دەرەوەو لە ئاوو گیا و گژا ڕواو سەوز بوو بەهەموو جۆر و ڕەنگ و شێوە جیاوەزەکانیەوە. بوونەوەریش هەر بەو شێوەیە کەوتە جوولەو بە گشت ئەستێرەکانیەوە چ گەڕۆك و چ وەستاو والله أعلم.

﴿وَإِذْ قَالَ رَبُّكَ لِلْمَلَٰٓئِكَةِ إِنِّي جَاعِلٌ فِي ٱلْأَرْضِ خَلِيفَةً ۖ قَالُوٓا۟ أَتَجْعَلُ فِيهَا مَن يُفْسِدُ فِيهَا وَيَسْفِكُ ٱلدِّمَآءَ وَنَحْنُ نُسَبِّحُ بِحَمْدِكَ وَنُقَدِّسُ لَكَ ۖ قَالَ إِنِّيٓ أَعْلَمُ مَا لَا تَعْلَمُونَ (٣٠)﴾

## ئاگادارکردنی فریشتەکان بەدانانی ئادەم و نەوەکانی لە زەویدا و قسەی فریشتەکان

خودای گەورە باسی منەتی خۆی دەکا بەسەر نەوەی ئادەمەوە کە ڕیزی لێناون بە ناو هێنانیان لەناوفریشتەکاندا لەپێش وەدی هێنانیان و ئەفەرموێت: ﴿وَإِذْ قَالَ رَبُّكَ لِلْمَلَٰٓئِكَةِ﴾ ئەو کاتەی پەروەردگاری تۆ ئەی موحەمەد(ﷺ) بە فریشتەکانی ڕاگەیاند، تۆش ئەو بەسەرهاتە بۆ ئومەتەکەت باس بکە: ﴿إِنِّي جَاعِلٌ فِي ٱلْأَرْضِ خَلِيفَةً﴾ من دەمەوێ بریکارێ جێگرێ لەسەر زەمین دیاری بکەم. واتە: گەلێك جێگری یەکتری بن ئومەت دوای ئومەت و نەوە دوای نەوە، وەك خودای گەورە لە ئایەتی تریشا ئەفەرموێت: ﴿وَهُوَ ٱلَّذِي جَعَلَكُمْ خَلَٰٓئِفَ ٱلْأَرْضِ﴾[1] هەر بۆخۆشی ئێوەی کردە جێنشینانی زەمین. وە ئەفەرموێت: ﴿وَيَجْعَلُكُمْ خُلَفَآءَ ٱلْأَرْضِ﴾[2] دەتانکاتە جێنشین لەم سەر زەمینە. وە ئەفەرموێت: ﴿وَلَوْ نَشَآءُ لَجَعَلْنَا مِنكُم مَّلَٰٓئِكَةً فِي ٱلْأَرْضِ يَخْلُفُونَ﴾[3] خۆ ئەگەر بمان ویستایە چەند فریشتەیەکمان لە ئێوە وەدی دەهێنا و دەمانکردن بە جێنشین لەسەر زەمین. وە ئەفەرموێت: ﴿فَخَلَفَ مِنۢ بَعْدِهِمْ خَلْفٌ﴾[4] ئەوسا جێنشینی بەد فەڕ هاتنە جێگایان. وادیارە فریشتەکان لەو قسانەدا کە کردویانە مەبەستیان ئادەم خۆی نەبووە. چونکە ئەگەر وابوایە قسەی فریشتەکان باش نەبوو: ﴿أَتَجْعَلُ فِيهَا مَن يُفْسِدُ فِيهَا وَيَسْفِكُ ٱلدِّمَآءَ﴾ وتیان: تۆ کەسێ وا دێنی لەوێ خراپە بکا و

[1] – الانعام ١٦٥
[2] – النمل ٦٢
[3] الزخروف ٦٠.
[4] الاعراف ١٦٩.

خوێن بڕێژێ. مەبەستیان ئەوە بوو لەو جنسی ئادەمە ئەوە دەکەن، وەك ئەوەی بە زانیاریەکی تایبەتی شارەزا کرابن، یان بەوەی کەلە سروشتی مرۆڤایەتی ئاگاداربوون. خودا ئاگاداری کردن کە ئەمانەی لە قوڕی وشك هەڵکەڕاوی دەفری گڵین وەدی دێنێ. یان فریشتەکان لە دروستکردنیان تێگەیشتن و زانیان کە خودا خۆی بەکارەکانیان دەکا و دادو بێدادیەکانیان بۆ چارەسەر دەکا. دەیان ترسێنێ لە تاوان و شکاندنی سنورەکان و لێیان قەدەغە دەکا. قسەی فریشتەکان لە ڕووی ئەوەوە نەبووە کە ڕەخنە بگرن یان ئیرەیی بەرن بە نەوەی ئادەم، وەك هەندێ لەزانایانی تەفسیر وا گومان دەکەن. چونکە خودای گەورە وا وەسفی فریشتەکانی کردووە کە هیچ پرسیارێکی لێ ناکەن بە ئیزنی خۆی نەبێ. وەك لێرەدا کاتێ کە ئاگاداری کردن کە بەو زوانە لەسەر زەمینا دروسکراوێ دروس دەکا. قەتادە ئەڵێت: لە پێشا ئاگاداری کردون کە ئەوانە لەسەر زەمینا خراپە کاری دەکەن: ﴿أَتَجۡعَلُ فِيهَا مَن يُفۡسِدُ فِيهَا وَيَسۡفِكُ ٱلدِّمَآءَ﴾وتیان: تۆ کەسی وا دێنی لەوێدا خراپە بکا و خوێن بڕێژێ. بێگومان ئەم پرسیار کردنەیان دەربارەی ڕاگەیاندن و دەرخستنی ئەو کارزانیەیە لەودا و دەڵێن: ئەی پەروەردگارمان حیکمەت چیە لە دروستکردنی ئەمانەدا کە هی وایان هەیە لە زەویدا خراپە کاری و خوێن ڕێژی دەکا[1]. ئەگەر مەبەست پەرستنی خۆتە ئێمە هەمیشە سوپاس و ستایشی تۆ دەکەین بە پاکی و بێعەیبی تۆدا هەڵئەدەین و تۆ دەپەرستین، هیچ شتێ لەو کارانەی ئەوان لە ئێمەوە ڕوو نادات، کەواتە بۆچی هەر ئێمە نەبین؟ خودای گەورە وەڵامی ئەو پرسیارەیان ئەداتەوە ئەفەرموێت: ﴿إِنِّيٓ أَعۡلَمُ مَا لَا تَعۡلَمُونَ﴾ کەچی ئێمە هەر شوکرانەی تۆ دەکەین پەسەنی و پیرۆزی تۆ ئەدەین. فەرمووی: ئەوەی من دەیزانم ئێوە ئاگاتان لێی نیە. واتە: من باش دەزانم لە دروستکردنی ئەمانەدا چ بەرژەوەندیەکی چاك هەیە لەگەڵ ئەو خراپەکاریانەی ئێوە باستان کرد کە ئێوە نایزانن. من پێغەمبەرانیان تیا ڕەوانە دەکەم و بۆیان دەنێرم و پیاو چاکان و شەهیدان و ڕاستگۆیان و خواناسان و دنیا نەویستان و نزیکان و زانایانی بە ئاکارو لە خواترس و خۆشەویستانی خودا لە نێوانیاندا پەیدا دەبێ. کە شوێن کەوتووی پێغەمبەرەکانیان دەبن سەلامی خوایان لێبێ، وە لە فەرمودەی سەحیحا هاتووە کە فریشتەکان کاتێ کە بەرز بوونەوە بۆلای پەروەردگاری مەزن بە کردارەکانی بەندەکانیەوە، خودا لێیان دەپرسێ: خودا خۆشی باشتر دەزانێ عەبدەکانی منتان چۆن بە جێ هێشت؟ ئەوانیش دەڵێن: هاتینە لایان هەر خواپەرستیان دەکرد، بەجێمان هێشتن هەر خواپەرستیان دەکرد. ئەو فریشتانە هەر هاتوو چۆیانە لەنێوانماندا و کۆدەبنەوە نوێژی بەیانی و وە لە نوێژی عەسراو ئەوانە

[1] الطبري /١/٤٦٤ ص٤٩.

دەمێننەوە و بە کردارەکانەوە بەرز دەبنەوە وەك پێغەمبەری خودا (ﷺ) ئەفەرموێت: کرداری شەو بەرز دەکرێتەوە بۆ لای لە پێش کرداری ڕۆژ، وە کرداری ڕۆژ لە پێش کرداری شەو[1]. کە دەڵێن: چوینەتە لایان ئەوان نوێژیان دەکرد و لەلاشیان لا چوین هەر نوێژیان دەکرد. ئەمە تەفسیری ئەوەیە کەپێی وتن: ﴿إِنِّيٓ أَعۡلَمُ مَا لَا تَعۡلَمُونَ﴾ وەڵامە بۆیان. واتە: من کارێکی گرنگ و بەجێم هەیە لە دروستکردنی ئەمانەدا ئێوە هیچی لێنازانن کە قسە دەکەن. وە هەندێ دەڵێن: ئەوە وەڵامە بۆ: ﴿نُسَبِّحُ بِحَمۡدِكَ وَنُقَدِّسُ لَكَ﴾ وە ئێمە هەر سوپاس وستایشی تۆ دەکەین و پەسەنی و پیرۆزی تۆ ئەدەین و﴿إِنِّيٓ أَعۡلَمُ مَا لَا تَعۡلَمُونَ﴾ فەرمووی: ئەوەی من دەیزانم ئێوە ئاگاتان لێی نیە. واتە: وە بوونی شەیتان لە نێوانتاندا ئەوە بەو شێوەیە نیە کە ئێوە وەسفی خۆتانی پێدەکەن. هەندێکیش دەڵێن قسەکەیان ئەوە دەگەیەنێ کە دەڵێت: ﴿أَتَجۡعَلُ فِيهَا مَن يُفۡسِدُ فِيهَا وَيَسۡفِكُ ٱلدِّمَآءَ وَنَحۡنُ نُسَبِّحُ بِحَمۡدِكَ وَنُقَدِّسُ لَكَ﴾ تۆ کەسێ وا دادەنێی خراپەکاری و خوێن بڕێژێ. کەچی ئێمە هەر شوکرانەی تۆ دەکەین و پەسەنی و پیرۆزی تۆ ئەدەین. داوایان کردووە کە ئەوان لەباتی ئەوەی ئادەم لە زەویدا جێگیر بکرێن. خودای گەورەش پێی فەرموون: ﴿إِنِّيٓ أَعۡلَمُ مَا لَا تَعۡلَمُونَ﴾ ئەوەی من دەیزانم ئێوە ئاگاتان لێی نیە. چونکە مانەوەی ئێوە لە ئاسماندا بۆ ئێوە چاکتر و لەبار ترە. ڕازی و چەندین زانای تریش ئەم وەڵامانەیان باسکردووە و الله أعلم.

**دەبێ جێنشین دابنرێت، هەندێ مەسەلە دەربارەی جێنشین**

قورتوبی ئەم ئایەتەی کردوەتە بەڵگە لەسەر پێویستکردنی جێ نشین بۆ ئەوەی هەڵسێ بۆ جێبەجێکردنی ئەو شتانەی کە خەڵکی لەسەری ناکۆك دەبن و کێشەکانیان بۆ چارەسەر بکا، وە یارمەتی ستەم لێکراوەکانیان بدا لەدەستی ستەم کاران و سنورەکانی خودا بپارێزێ و تەمێی ئەو کەسانەش بکا کە هەڵدەستن بە کاری ناپەسەند و چەندین شتی تریش کە جێ بە جێ ناکرێ بە بونی جێنشین نەبێ. هەرشتێك واجیب بەو نەبێ تەواو نەبێ ئەو شتەیش واجیبە. جێنشین بە دەق وەردەگیرێ وەك هەندێ لە ئەهلی سونە دەڵێن دەربارەی ئەبو بەکر. یان بە هێما بۆ کردن وەك هەنێکی تر دەڵێن. یان بە دانانی جێنشینێکی تر دوای خۆی وەك ئەبو بەکر دەربارەی عومەری کوڕی خەتاب کردی. یان وازی لێدەهێنێ بۆ ڕاوێژ کردن لە نێوان کۆمەڵێ لە پیاو چاکان، دیسان وەك ئەوەی عومەر کردی، یان بە کۆدەنگی ئەهلی حەل و عەقد بە پەیمان پێانی. یان پەیمان دان بە یەکێ لەوانە بۆی. ئەمە واجبە پابەندبوون پێیەوە لەلای کۆی زانایان. پێویستە ئەو پێشەوایە نێر بێ و ئازاد بێ و پێگەیشتوو بێ و

---

[1] مسلم/١٧٩/ومسند ابی عوان/١/١٤٥ ص٥٠.

ژیر بێ و مسوڵمان بێ، دادپەروەر بێ و موجتەهید و بەرچاو ڕوون و لەش ساغ و شارەزا بێ و لە جەنگ و پێشنیاردا و قورەیشی بێت. مەرج نیە هاشمی و دوور لەتاوان بێ بە پێچەوانەی ڕای غولاتی ڕافیزەوە ئەگەر پێشەوا خراپە کاری کرد دوور دەخرێتەوە یان نا؟ ڕای جیاواز هەیە. بەڵام ڕای سەحیح ئەوەیە لا ناخرێت بە پێی ئەم فەرمودەی پێغەمبەر(ﷺ) کە ئەفەرموێت: مەگەر کوفرێکی ئاشکرا ببینن و بەڵگەتان لای خواوە هەبێت لەسەری[1]. ئایا پێشەوا بۆی هەیە خۆی بەرکەنار خات؟ ڕای جیاواز هەیە لەسەری، حەسەنی کوڕی عەلی ڕەزای خوای لێبێ خۆی بەرکەنار خست و فەرمانەکەی دایە دەست معاویە، بەڵام ئەوە لەبەر بەهانەیە بوو(غدر) ستایش کرا لەسەر ئەوە بەڵام دانانی دوو پێشەوا یان زیاتر لە شوێنێکا دروست نیە بە پێی ئەم فەرمودەیەی پێغەمبەر (ﷺ) کە ئەفەرموێت: کەسێ هاتە ناوتان کاتێ کە یەك بوون بیەوێ دووبەرەکی بخاتە نێوانتان. با هەرکەسێ بێ بیکوژن[2]. ئەمە قسەی جمهورە. ئیمامی حەرەمەین گێڕاویەتیەوە لە ئەبو ئیسحاقەوە کە درووستە دانانی دوو پێشەوا یان زیاتر ئەگەر وڵاتەکانیان لە یەکتر دوور بوو، هەرێمەکانیشیان لە نێواندا فراوان بوو. بەڵام ئیمامی حەرەمەین خۆی دوودڵ بووە لەوەدا.

﴿ وَعَلَّمَ ءَادَمَ ٱلْأَسْمَآءَ كُلَّهَا ثُمَّ عَرَضَهُمْ عَلَى ٱلْمَلَٰٓئِكَةِ فَقَالَ أَنۢبِـُٔونِى بِأَسْمَآءِ هَٰٓؤُلَآءِ إِن كُنتُمْ صَٰدِقِينَ ﴿٣١﴾ قَالُوا۟ سُبْحَٰنَكَ لَا عِلْمَ لَنَآ إِلَّا مَا عَلَّمْتَنَآ ۖ إِنَّكَ أَنتَ ٱلْعَلِيمُ ٱلْحَكِيمُ ﴿٣٢﴾ قَالَ يَٰٓـَٔادَمُ أَنۢبِئْهُم بِأَسْمَآئِهِمْ ۖ فَلَمَّآ أَنۢبَأَهُم بِأَسْمَآئِهِمْ قَالَ أَلَمْ أَقُل لَّكُمْ إِنِّىٓ أَعْلَمُ غَيْبَ ٱلسَّمَٰوَٰتِ وَٱلْأَرْضِ وَأَعْلَمُ مَا تُبْدُونَ وَمَا كُنتُمْ تَكْتُمُونَ ﴿٣٣﴾ ﴾

### ڕێزی ئادەم بەسەر فریشتەکاندا

ئەمە ئەو شوێنەیە کە خودای گەورە باسی ڕێزی ئادەمی تیا کردووە بەسەر فریشتەکاندا، ئادەمی تایبەتمەند کردووە بە شارەزا بوون بە گشت ناوەکان و فریشتەکانی لێشارەزا نەکردووە. ئەمەیش دوای سوجدە بردنیان بۆی وە بێئاگاییان لە حیکەتی وەدی هێنانی جێنشین کاتێ کە پرسیاریان کرد دەربارەی، خودای گەورە هەواڵی پێدان کە ئەو خۆی دەزانێ بەڵام ئەوان ئاگایان لێی نیە. هەر بۆیە دوای ئەوە ئەمەی باس کردووە تا ڕێزی ئادەمیان بۆ دەرخات کە لە شارەزایدا ڕێزی داوە بەسەر ئەواندا و ئەفەرموێت: ﴿ وَعَلَّمَ ءَادَمَ ٱلْأَسْمَآءَ كُلَّهَا ﴾ خودا هەموو ناوێکی فێری ئادەم کرد. زەحاك ئەڵێت: لە ئیبنو عەباسەوە: ﴿ وَعَلَّمَ ءَادَمَ ٱلْأَسْمَآءَ كُلَّهَا ﴾خودا هەموو ناوێکی فێری ئادەم کرد،ئەو ناوانەی کە خەڵکی لەناو یەکتریا فێری بوون. وەك مرۆڤ و ئاژەڵ و ناوی زەویی و دەشت و دەریا و

---

[1] البخاری /٧٠٥٦/، الطبری /١/٤٧٧ ص٥٠.

[2] مسلم /٣/١٤٧٠ ص٥٠.

ئەسپ و کەرو وێنەی ئەمانەو گشت شتێکی تر[1]. ئیبنو ئەبی حاتەم ڕیوایەتی کردووە لە ئیبنو جەریرەوە لە فەرمودەکەی عاسمی کوڕی کولەیبەوە لە سەعدی کوڕی مەعبەدەوەلە ئیبنو عەباسەوە: ﴿ وَعَلَّمَ ءَادَمَ ٱلْأَسْمَآءَ كُلَّهَا ﴾ خودا هەموو ناوێکی فێری ئادەم کرد. ئەڵێت: تا ناوی دەفرو مەنجەڵیشی فێر کرد. وە ئەڵێت: بەڵێ تا (الفسوة و الفسية) فێر کردووە[2]، ڕاستر ئەوەیە کە هەموو ناوێکی فێر کرد بنەڕەتی و سیفەت و کرداریشی وەك ئیبنو عەباس ئەڵێت: (الفسوة و الفسية) واتە: ناوی هەموو شتێ و هەموو کردارێ گەورە یا بچوك. بوخاری ڕیوایەتی کردووە. لە تەفسیری ئەم ئایەتەدا لە کتێبی تەفسیردا لە سەحیحەکەیدا لە ئەنەسی کوڕی مالیکەوە کە پێغەمبەری خودا(ﷺ) فەرمویەتی: ڕۆژی قیامەت خاوەنباوەڕان کۆ دەبنەوە و دەڵێن: ئەگەر بەکەسێکمان بوتایە کە شەفاعەتما بۆ بکا لەلای پەروەردگارمان. دەچنە خزمەت ئادەم سەلامی خوای لێبێ پێی دەڵێن: تۆ باوکی هەموو خەڵکی، خوا بەدەستی خۆی تۆی دروست کرد، فریشتەکانی سوجدەیان بۆ بردی، ناوی هەموو شتێکی فێر کردی، شەفاعەتمان بۆ بکە لەلای پەروەردگارت، تا لەم جێگەیەدا ڕەحەتمان بکات. ئەفەرموێت: من لە پلەیەدا نیم کە ئێوە لێی تێدەگەن. گوناهەکەی خۆی باس دەکا و شەرم دەکا لە خودای خۆی و ئەفەرموێت: بچنە لای نوح کە یەکەم پێغەمبەرێکە خودا ڕەوانەی کردووە بۆ خەڵکی سەر ڕووی زەمین. ئەوانیش دەچنە لای نووح سەلامی خوای لێبێ ئەفەرموێت: من لەو پلەیەدا نیم وەك ئێوە لێی تێدەگەن. داواکەی خۆی کە کردوویەتی باسی دەکا کە لە پەروەردگاری کردووە،کە هیچ شارەزاییەکی نەبوو لە بارەیەوە، شەرم دەکا. ئەفەرموێت: بچنە لای خەلیلی ڕەحمان دەچن بۆ لای، دەڵێت: من لەو پلەیەدا نیم وەك ئێوە لێی تێدەگەن. ئەفەرموێت بچنە لای موسا سەلامی خوای لێبێ عەبدێکە خودا قسەی لەگەڵ کردووە و تەوراتیشی پێبەخشیوە. ئەویش ئەفەرموێت: من لەو پلەیەدا نیم وەك ئێوە لێی تێدەگەن. باسی کوشتنی گیانێکی کرد، کە فەرمانی پێنەکرابوو بیکوژێ. شەرمی کرد لە پەروەردگار و وتی بچنە لای عیسا سەلامی خوای لێبێ بەندەی خوداو پێغەمبەرو کەلیمەی خوداو ڕوحی خودایە: دەچنە لای و ئەفەرموێت: من لەو پلەیەدا نیم وەك ئێوە لێی تێدەگەن. بچنە لای موحەمەد(ﷺ) کە عەبدێکە خوا لە گوناهی ئەوەڵ و ئاخیری خۆش بووە. فەرمووی: دێنە لای من دەچم تا ئیزن لە پەروەردگارم وەرگرم، ئیزن ئەدرێم، کاتێ کە پەروەردگارم بینی کە بەسوجدەدا دەکەوم. خودای گەورەلە سوژدەدا وازم لێدێنێ ئەوەندەی خۆی مەیلی لێبێ، پاشان فەرمانم پێدەکرێ: ئەی مەحەمەد(ﷺ)! سەرت هەڵبڕە داوا بکە پێت بدرێ، قسە بکە گوێت لێبگیرێ،

---

[1] الطبری /١/٤٥٨ ص٥١.

[2] الطبری /١/٤٨٥.

شەفاعەت بکە قبولْ بکرێ، ئەو کاتە سەر هەڵدەبڕم، ستایشی دەکەم بە ستایشێ کە خودا خۆی فێرم دەکا، لە دوایدا شەفاعەت دەکەم، سنورێکم بۆ دیاری دەکرێ، ئەوانە دەخەمە بەهەشت، پاشان دەچمەوە بۆ لای خودا و کە پەروەردگارم بینی پاشان بە سوژدەدا دەکەوم، ئەوندە خودا مەیلی لێبێ لە سوژدەدا بم دەمێنمەوە پاشان شەفاعەت دەکەم سنورێکم بۆدیاری دەکرێ دەیانخەمە بەهەشت، پاشان سێهەم جار دەگەڕێمەوە، چوارەم جاریش دەچمەوە دەڵێم: ئەی خودایە! لەناو ئاگرا ئەوانە نەبێ کە قورئان بەندی کردوون لە ئاگرا تا هەتایی دەمێننەوە هیچ کەس نەماوە[1]. موسلیم وو نەسائی و ئیبنو ماجەش ڕیوایەتیان کردووە[2]. مەبەست لە هێنانی ئەم فەرمودەیە لێرەدا پێغەمبەری خودا(ﷺ) فەرمویەتی: دەچنە لای ئادەم و دەڵێن: تۆ باوکی هەموو خەڵکیت و خودا بەدەستی خۆی دروستی کردووی، فریشتەکان سوژدەیان بۆ بردی و فێری ناوی هەموو شتێکی کردی[3]. هەربۆیە فەرمویەتی: ﴿ثُمَّ عَرَضَهُمْ عَلَى الْمَلَائِكَةِ﴾ پاشان هەموو شتەکانی پیشانی فریشتەکاندا. وەك عەبدالرەزاق لە عومەرەوە لە قەتادەوە ئەڵێت: پاشان ئەوناوانەی پیشانی فریشتەکان دا: ﴿فَقَالَ أَنبِئُونِي بِأَسْمَاءِ هَٰؤُلَاءِ إِن كُنتُمْ صَادِقِينَ﴾[4] فەرموی: ئەگەر ڕاستی بۆ چون،ناوی ئەوانەم بۆ هەڵدەن. یانی: ناوی ئەو شتانەم بۆ هەڵدەن ئەی ئەو فریشتانەی کە دەڵێن: ﴿أَتَجْعَلُ فِيهَا مَن يُفْسِدُ فِيهَا وَيَسْفِكُ الدِّمَاءَ﴾ تۆ کەسێ وا دێنی کە لەوێدا خراپەبکا و خوێن بڕێژێ. لە ئێمە یان جگە لە ئێمە،کەچی ئێمە هەر شوکرانەی تۆ دەکەین و پەسەنی و پیرۆزی تۆ ئەدەین؟ خودای مەزنیش ئەفەرموێت ئەگەر ئێوە قسەی ڕاست دەکەن کە من لە زەویدا کەسانێکم دروست کردووە جگە لە ئێوە خۆی و وەچەکانی سەرپێچی من دەکەن و خراپەو خوێنڕێژی دەکەن. ئەگەر ئێوە دانایە تێیدا گوێڕایەڵیتان دەکردم و فەرمانەکانی منتان بەجێ دەهێنا و شوکرانە بژێر دەبوون، کاتێ ئێوە ناوی ئەو شتانە نازانن کە پیشانم دان و دەیبینن،کەواتە ئێوە شتێکە نیە و هێشتا نەبووە. دیارە باشتر لێی بێئاگان: ﴿قَالُوا سُبْحَانَكَ لَا عِلْمَ لَنَا إِلَّا مَا عَلَّمْتَنَا ۖ إِنَّكَ أَنتَ الْعَلِيمُ الْحَكِيمُ﴾ وتیان: پاك وبێعەیبی هەر بۆتۆیە، ئێمە جگە لەوەی تۆ فێرت کردووین، هیچ نازانین هەر خۆت زانای کار زانی. ئەمە پاکی و پیرۆزی هەڵدانە لەلایەن فریشتەکانەوە بۆ خودای گەورە، کە هیچ کەسێ نیە پەی بەرێ بە

---

[1] فتح الباری /٨/ ١٠ ص٥١.

[2] مسلم /١/١٨١/، النسائی فی الكبرا/٦/٢٨٤.

[3] مسلم /١/١٨١/، النسائی فی الكبرا/٦/٣٦٤/، ابن ماجة/٢/١٤٤٢ ص٥١.

[4] عبدالزاق /١/٤٢.

زانیاریەکانی خودا مەگین خودا خۆی بیەوێ. ئەوان هیچ شتێ نازانن مەگین شتێ کە خودا خۆی فێری کردبن. هەر بۆیە وتیان: ﴿ قَالُواْ سُبْحَٰنَكَ لَا عِلْمَ لَنَآ إِلَّا مَا عَلَّمْتَنَآ إِنَّكَ أَنتَ ٱلْعَلِيمُ ٱلْحَكِيمُ ﴾ پاك وبێعەیبی هەر بۆتۆیە، ئێمە جگە لەوەی کە تۆ فێرت کردووین هیچ نازانین. هەر خۆت زانای کارزانی. واتە هەر خۆت ئاگات لە هەموو شتێکە و کارزانی لە کارو فەرماننا. کەسێ فێر دەکەی و کەسێکیش فێر ناکەی ویستی خۆتە و کارەکانت پڕە لە کارزانی وهەر ئەوە ڕاست و تەواوە.

**دەرخستنی ڕێزی ئادەم بە زانیاریەکەی**

خودای گەورە ئەفەرموێت: ﴿ قَالَ يَٰٓـَٔادَمُ أَنۢبِئْهُم بِأَسْمَآئِهِمْ فَلَمَّآ أَنۢبَأَهُم بِأَسْمَآئِهِمْ قَالَ أَلَمْ أَقُل لَّكُمْ إِنِّىٓ أَعْلَمُ غَيْبَ ٱلسَّمَٰوَٰتِ وَٱلْأَرْضِ وَأَعْلَمُ مَا تُبْدُونَ وَمَا كُنتُمْ تَكْتُمُونَ ﴾ فەرموی: ئەی ئادەم! دەسا تۆ ناوی هەموو ئەوانەیان بۆ هەڵبدە. کاتێ ئادەم هەموو ناوێکی بۆ هەڵدان. فەرموی: من بە ئێوەم نەوت، کە هەرخۆم هەر نەهێنیەك لە ئاسمانەکان و زەمیندایە و هەرچی ئێوە بیشارنەوە و بیدرکێنن دەیانزانم؟ زەیدی کوڕی ئەسلەم ئەڵێت: وتی: تۆ جوبرئیل تۆ ئەی میکائیل، تۆ ئەی ئیسرافیل، تا گشت ناوەکانی هەژمار کردتا گەیشتە قەلەڕەش[1]. موجاهید ئەڵێت: لەم دەقەدا کە خودای گەورە ئەفەرموێت: ﴿ قَالَ يَٰٓـَٔادَمُ أَنۢبِئْهُم بِأَسْمَآئِهِمْ ﴾ فەرموی: ئەی ئادەم! دەسا تۆ ناوی هەموو ئەوانەیان بۆ هەڵبدە. وتی: ناوی کۆترو قەلەڕەش و ناوی شتەکانی تریشی بۆ هەڵدا[2]. ڕیوایەت کراوە لە سەعیدی کوڕی جوبەیرو حەسەن و قەتادەیشەوە وە هەر بەو جۆرە[3]. کاتێ کە ئادەم سەرکەوت بەسەر فریشتەکاندا لە هەڵدانی ناوەکاندا بەو شێوەیەی کە خودا فێری کردبوو، خودای گەورە فەرموی بە فریشتەکان: ﴿ أَلَمْ أَقُل لَّكُمْ إِنِّىٓ أَعْلَمُ غَيْبَ ٱلسَّمَٰوَٰتِ وَٱلْأَرْضِ وَأَعْلَمُ مَا تُبْدُونَ وَمَا كُنتُمْ تَكْتُمُونَ ﴾ من بە ئێوەم نەوت، گشت نەهێنیە لە ئاسمانەکان و زەمیندایە و هەرچی ئێوە دەربخەن وبیشارنەوە دەیزانم؟ وەك خودای گەورە ئەفەرموێت: ﴿ وَإِن تَجْهَرْ بِٱلْقَوْلِ فَإِنَّهُۥ يَعْلَمُ ٱلسِّرَّ وَأَخْفَى ﴾[4] ئەگەر دەنگیشت هەڵبڕی، ئەو بە نەهێنی و نزم تریش دەزانێ. وەك دەربارەی پەپوسلێمانە خودای گەورە ئەفەرموێت: ﴿ أَلَّا يَسْجُدُواْ لِلَّهِ ٱلَّذِى يُخْرِجُ ٱلْخَبْءَ فِى ٱلسَّمَٰوَٰتِ وَٱلْأَرْضِ وَيَعْلَمُ مَا تُخْفُونَ وَمَا تُعْلِنُونَ ۝٢٥ ٱللَّهُ لَآ إِلَٰهَ إِلَّا هُوَ رَبُّ

---

[1] ابن ابی حاتم /١١٨/١ ص٥٢.
[2] ابن لبی حاتم/١١٩/١.
[3] ابن ابی حاتم/١١٩/١.
[4] طه ٧.

ٱلۡعَرۡشِ ٱلۡعَظِيمِ ﴾[1] بۆ ئەوی سوژدە نەبەن بۆ ئەو خودایەی کە ئەوەی شاراوە بێت لە ئاسمانەکان و زەویدا دەری دەخات. ئەوەیش دەی شارنەوەو ئەوی دەری دەخەن دەیزانێ، ئەو خودایەی کە لەو بەدەر هیچ شت بۆ پەرستن نابێ و ئەو پەروەرێنی تەختی (عەرش) هەرە مەزنە. زەححاك ڕیوایەتی کردووە لە ئیبنو عەباسەوە: ﴿وَأَعۡلَمُ مَا تُبۡدُونَ وَمَا كُنتُمۡ تَكۡتُمُونَ﴾ هەچی ئێوە بیشارنەوەو بیدرکێنن دەیزانم. وتی: ئەفەرموێت: وەك چۆن ئاگام لە ئاشکرایە ئاواش ئاگاداری نەهێنیەکانم. واتە: ئەوەی شەیتان شاردبویەوە لە دلّی خۆیدا لە خۆبەزل زانی لە خۆبایی بوون[2]. ئەبو جەعفەری ڕازی ئەلّێت: لە ڕەبیعی کوڕی ئەنەسەوە: ﴿وَأَعۡلَمُ مَا تُبۡدُونَ وَمَا كُنتُمۡ تَكۡتُمُونَ﴾ هەچی ئێوە بیشارنەوە بیدرکێنن من دەیزانم. وتی: ئەوەی کە ئاشکرایان کرد،ئەوە بوو کە وتیان: ئەی خودایە تۆ کەسێ وا دادەنێیت کە خراپە بکا و خوێن برێژێ. ئەوەیش لە نێوان خۆیاندا دەیانشاردەوە، ئەوە بوو دەیان وت،پەروەردگارمان هیچ دروستکراوێ دروست ناکا مەگین ئێمە لەوان شارەزاتر و بەرێز ترین، بۆیان دەرکەوت کە خودا ڕێزی ئادەمی داوە بەسەر ئەواندا لە شارەزایی و چاکیدا.

﴿ وَإِذۡ قُلۡنَا لِلۡمَلَٰٓئِكَةِ ٱسۡجُدُواْ لِأٓدَمَ فَسَجَدُوٓاْ إِلَّآ إِبۡلِيسَ أَبَىٰ وَٱسۡتَكۡبَرَ وَكَانَ مِنَ ٱلۡكَٰفِرِينَ ﴿٣٤﴾ ﴾

**ڕێزگرتنی ئادەم بە سوژدەبردنی فریشتەکان بۆی**

خودای گەورە ئەفەرموێت: ﴿ وَإِذۡ قُلۡنَا لِلۡمَلَٰٓئِكَةِ ٱسۡجُدُواْ لِأٓدَمَ فَسَجَدُوٓاْ إِلَّآ إِبۡلِيسَ أَبَىٰ وَٱسۡتَكۡبَرَ وَكَانَ مِنَ ٱلۡكَٰفِرِينَ﴾ فەرمانمان بە فریشتەکان دا، سوژدە لەبەر ئادەم بەرن جگە لە ئیبلیس هەویان سوجدەیان بۆ برد، ئەو خۆی بە زلتر زانی سوژدەی نەبردو سپلّە بوو. ئەمە ڕێزێکی زۆر مەزنە لەلایەن خوداوە بۆ ئادەم، خودا منەت دەکا بەسەر نەوەکانیا کاتێ ڕای دەگەیەنێ کە فەرمانی داوە بە فریشتەکان سوژدە بەرن بۆ ئادەم فەرمودەی زۆر لەم بارەیەوە هاتووە،لەوانە فەرمودەکی شەفاعەت کە لە پێشەوە هێنامان، وە فەرمودەکەی موسا سەلامی خوای لێبێ: پەروەردگارم ئەو ئادەمەی کە خۆیشی و ئێمەشی لەبەهەشت دەرکرد نیشاندە، کاتێ کە پێی گەیشت پێی وت: تۆ ئەو ئادەمەی کە خودا بەدەستی خۆی دروستی کردی و خودا لە ڕۆحی خۆی ڕۆحی کردوی بەبەردا و فریشتەکانیش سوژدەیان بۆ بردووە[3].

---

[1] النمل ٢٥-٢٦.

[2] الطبری /١/٤٩٨.

[3] ابو جاود /٥/٢٨ سەحیحە.

### شەیتان یەکێك بوو لەوانە کە فەرمانی پێدرا سوژدە بەرێ، بەلآم فریشتە نەبوو

کاتێ کە خودای گەورە فەرمانی دا بە فریشتەکان کە سوژدە بەرن بۆ ئادەم، ئیبلیسیش بەر ئەو فەرمانە کەوت، هەرچەندە ئەو لە توخمی ئەوان نەبوو بەلآم وەك ئەوان هەلسوکەوتی دەکرد، لەبەر ئەوە، ئەو فەرمانە ئەویشی گرتەوە سەرپێچی کردو نەفرینی لێکرا بەیارمەتی خودای گەورە کە گەیشتینە ئەم ئایەتە باسی دەکەین کە ئەفەرموێت: ﴿إِلَّآ إِبۡلِيسَ كَانَ مِنَ ٱلۡجِنِّ فَفَسَقَ عَنۡ أَمۡرِ رَبِّهِۦٓ﴾ ئیبلیس نەبێ لە تیرەی جنۆکە بوو لە فەرمانی پەروەردگاری سەرپێچی کرد. بۆیە موحەمەدی کوڕی ئیسحاق ڕیوایەتی کردووە لە ئیبنو عەباسەوە ئەلێت: شەیتان لە پێش ئەوەدا کە ئەو سەرپێچیە بکا لەگەڵ فریشتەکان بووە ناوی عەزازیل بووە و لە دانیشتوانی زەوی بووە. لە هەموو فریشتەکانی تر تێکۆشەرتر بووە و زانا تریش بووە. ئەوە وای لێکرد کە خۆی بەزل بزانێ. لە ناوچەیەك بووە پێیان وتووە جین –ئیمونە جنا–[1].

### بەرفەرمانیەکە بۆ خودا بووە و سوژدەکەیش بۆ ئادەم

قەتادە ئەلێت: لەم ئایەتەدا: ﴿وَإِذۡ قُلۡنَا لِلۡمَلَٰٓئِكَةِ ٱسۡجُدُواْ لِأٓدَمَ﴾ کاتێ بە فریشتەکانمان وت: سوژدە بەرن بۆ ئادەم، گوێڕایەڵیەکە بۆ خودا بووەو سوژدەکەیش بۆ ئادەم خودا ڕێزی لە ئادەم نا بەوەی کە سوژدەیان بۆ برد[2]. هەندێ لە خەڵکی دەڵێن: ئەو سوژدەیە سلاوو ڕێزو قەدر بووە، وەك خودای گەورە ئەفەرموێت: ﴿ وَرَفَعَ أَبَوَيۡهِ عَلَى ٱلۡعَرۡشِ وَخَرُّواْ لَهُۥ سُجَّدٗاۖ وَقَالَ يَٰٓأَبَتِ هَٰذَا تَأۡوِيلُ رُءۡيَٰيَ مِن قَبۡلُ قَدۡ جَعَلَهَا رَبِّي حَقّٗاۖ ﴾[3] باوك ودایکی لەسەر تەخت دانا و هەموویان سوژدەیان بۆ برد. وتی: بابە گیان! ئەمە خەونەکەی پێشومە، پەروەردگارم ئاکامەکەی وەدی هێنا. ئەم سوژدە بردنە لە چەرخی گەلە پێشوەکاندا ڕەوا بووە. بەلآم لە ئاینی خۆماندا نەسخ کراوەتەوە مەعاز ئەلێت: چووم بۆ شام چاوم لێیان بوو سوژدەیان بۆ زانا و قەشەکانیان دەبرد وتم: ئەی پێغەمبەری خودا تۆ شایستە تری کە سوژدەت بۆ ببرێت، فەرمووی: نەخەیەر، ئەگەر من فەرمانم بدایە کە مرۆڤ سوژدە ببات بۆ مرۆڤ، فەرمانم ئەدا کە ژن سوژدە ببات بۆ مێردەکەی لە زۆری هەقی مێردەکەی بە سەریەوە[4]. ڕازیش پەسەندی کردووە.

---

[1] الطبری /١/٥٠٢.

[2] الطبری /١/٥١٢ ص٥٢.

[3] یوسف ١٠٠.

[4] الترمزی /١١٥٩/، المجمع/٤/٣١٠/مەرفوعی سەحیحە.

## خۆ بەزل زانینی شەیتان

قەتادە لەم ئایەتەدا کە خودای گەورە ئەفەرموێت ﴿فَسَجَدُوٓاْ إِلَّآ إِبۡلِيسَ أَبَىٰ وَٱسۡتَكۡبَرَ وَكَانَ مِنَ ٱلۡكَٰفِرِينَ﴾ جگە لە ئیبلیس هەموویان سوژدەیان بۆ برد ئەو کە خۆی بەزل زانی، سوژدەی نەبردو سپڵە بوو. دوژمنی خودا شەیتان ئیرەیی بە ئادەم بر سەلامی خوای لێبێ بەهۆی ئەو ڕێزەوە کە خودا لێی گرت. بۆیە وتی: من لە ئاگرم، ئەو لە قوڕە، ئەوە سەرەتای تاوانە گەورەکە بوو، دوژمنی خودا خۆی بە گەورەتر زانی لەوەی کە سوژدە بەرێ بۆ ئادەم سەلامی خوا لێبێ[1]. منیش دەڵێم: لە فەرمودەی سەحیحدا هاتووە: ناچێتە بەهەشت کەسێ بە ئەندازەی گەردیلەیەك لە خەرتەلە خۆ بەزل زانی لە دڵیدا بێت[2]. ئیبلیس خۆ بەزل زان و سپڵە بوو. ئەوە بوە هۆی دەرکردنی و دورخستنەوەی لە بەزەیی خودای مەزن.

﴿ وَقُلۡنَا يَٰٓـَٔادَمُ ٱسۡكُنۡ أَنتَ وَزَوۡجُكَ ٱلۡجَنَّةَ وَكُلَا مِنۡهَا رَغَدًا حَيۡثُ شِئۡتُمَا وَلَا تَقۡرَبَا هَٰذِهِ ٱلشَّجَرَةَ فَتَكُونَا مِنَ ٱلظَّٰلِمِينَ ﴿٣٥﴾ فَأَزَلَّهُمَا ٱلشَّيۡطَٰنُ عَنۡهَا فَأَخۡرَجَهُمَا مِمَّا كَانَا فِيهِۖ وَقُلۡنَا ٱهۡبِطُواْ بَعۡضُكُمۡ لِبَعۡضٍ عَدُوّٞۖ وَلَكُمۡ فِي ٱلۡأَرۡضِ مُسۡتَقَرّٞ وَمَتَٰعٌ إِلَىٰ حِينٖ ﴿٣٦﴾﴾

## ڕێزێکی تر لە ئادەم

خودای مەزن ئەفەرموێت: ﴿ وَقُلۡنَا يَٰٓـَٔادَمُ ٱسۡكُنۡ أَنتَ وَزَوۡجُكَ ٱلۡجَنَّةَ ﴾ وتمان: ئادەم خۆت و ژنت لە بەهەشت نیشتەجێ بن، خودای گەورە باسی ئەوە دەکا ڕێزێکی تریشی لە ئادەم گرتووە دوای سوژدە بردنی فریشتەکان بۆی جگە لە ئیبلیس، بەهەشتی ڕەوا بینی بۆیی و لەهەر کوێیدا دادەنیشێ ئارەزوی خۆیەتی. هەچیش دەخوات بابیخوات و نۆشی گیانی بێ. حافیز ئەبو بەکری کوڕی مەردەوەیهی ڕیوایەتی کردووە لە ئەبو زەڕەوە ئەڵێت: وتم ئەی پێغەمبەری خودا(ﷺ)تۆ لات وایە کە ئادەم پێغەمبەر بووە؟ فەرموی بەڵێ، پێغەمبەرێکی ڕەوانە کراو بووە، خودا بە ئاشکرا قسەی لەگەڵدا کردووە[3]. فەرمویەتی: ﴿ٱسۡكُنۡ أَنتَ وَزَوۡجُكَ ٱلۡجَنَّةَ ﴾ خۆت و ژنەکەت لە بەهەشت نیشتەجێ بن.

## حەواء دروستکرا پێش ئەوەی ئادەم بچێتە بەهەشت

ئایەتەکە ئەوە دەگەیەنێ کە حەوا پێش چوونە بەهەشتی ئادەم وەدی هاتووە، موحەمەدی کوڕی ئیسحاق ئاماژەی پێکردووە وئەڵێت: کاتێ کە خودای گەورە سەرزەنشتی شەیتانی کرد، پاشان ڕووی

---

[1] ابن ابی حاتم/١/١٣٢.
[2] مسلم /١/٩٣ ص٥٣.
[3] العضمة /٥/١٥٥٣/، سەنەدەکەی باشە ص٥٣.

له ئادەم كردو گشت ناوەكانی فێركرد و فەرموی: ﴿يَٰٓـَٔادَمُ أَنۢبِئۡهُم بِأَسۡمَآئِهِمۡ﴾ ئەی ئادەم! تۆ ناوی ئەوانەیان بۆ هەڵدە، وتی: پاشان ئادەم خەوی لێكەوت وەك له ڕێگەی ئەهلی كتێبەوە پێمان گەیشتووە له ئەهلی تەورات و كەسانی تریشەوەله زانایان وەكو ئیبنو عەباس و زانایانی تریش. پاشان خودای مەزن پەراسویەك له پەراسوەكانی لای چەپی هەڵگرت و له جێگەی گۆشتی دانا. ئادەم هەر لەخەودا بوو خەبەری نەبوەوە، تا خودا لەو پەراسوەی حەوای خێزانی بۆ دروستكردو كردیە ژنێك تا لەبەری بحەسێتەوە، كاتێ له خەوەكە خەبەری بوەوە، سەیری كرد له تەنیشتیدایە وەك دەڵێن والله أعلم. وتی: گۆشتی خۆمە و خوێنی خۆمە و هاوسەریشمە. دڵی پێی خۆش بوو، كاتێ كە خودای گەورە كردیە خێزانی و وای لێكرد دڵی پێی ئارام بگرێ. خودای گەورە پێی فەرموو: ﴿وَقُلۡنَا يَٰٓـَٔادَمُ ٱسۡكُنۡ أَنتَ وَزَوۡجُكَ ٱلۡجَنَّةَ وَكُلَا مِنۡهَا رَغَدًا حَيۡثُ شِئۡتُمَا وَلَا تَقۡرَبَا هَٰذِهِ ٱلشَّجَرَةَ فَتَكُونَا مِنَ ٱلظَّٰلِمِينَ﴾[1] وتمان: ئادەم خۆت و ژنت له بەهەشت نیشتە جێ بن، هەرچی و لەهەر شوێنێ دەخۆن، نۆشی گیانتان بێت هەر توخنی ئەم دارە مەكەون، چونكە بەم كارە له ناهەقی كاران دەژمێرێن.

## تاقی كردنەوەی ئادەم

كە خودای گەورە ئەفەرموێت: ﴿وَلَا تَقۡرَبَا هَٰذِهِ ٱلشَّجَرَةَ﴾ هەر نزیكی ئەم دارە مەكەون. ئەمە تاقی كردنەوەیەكی خودا بوو بۆ ئادەم، جیاوازی بۆچوون هەیە دەربارەی ئەم درەختە كامەیە؟ هەندێ دەڵێن: مێوە. هەندێ دەڵێن گەنمە. دارخورمایە، هەندێ دەڵێن: هەنجیرە، وە هەندێ دەڵێن: درەختێ بووە هەركەسێ لێی بخواردایە دەستنوێژی دەشكا. وە هەندێ دەڵێن: درەختێ بووە فریشتەكان بەرەكەیان دەخوارد بۆ هەر مانەوەیان. ئیمام ئەبو جەعفەری كوڕی جەریر ئەڵێت: ڕاستیەكەی ئەوەیە كە بوترێ: خودای گەورە قەدەغەی كرد له ئادەم و هاوسەرەكەی كە له درەختێكی دیاری كراو نەخۆن له درەختەكانی بەهەشت، ئیتر ئارەزوی خۆیانە لەهەر درەختێكی تر ئەخۆن، كەچی ئەوان لەو درەختەیان خوارد، ئێمە نازانین ئەو درەختە كام درەخت بووە. چونكە خودای گەورە هیچ بەڵگە و نیشانەیەكی نەداوە بە عەبدەكانی لەو بارەیەوە نە له قورئاندا و نە له فەرمودەی سەحیحیشدا. وتراوە: ئەو درەختە گەنم بووە. وتراوە: ئەو درەختە ترێ بووە. وتراوە: درەختی هەنجیر بووە. دەبێ یەكێك لەو درەختانە بوبێ. ئەوە زانیاریەكە ئەگەر زانرایش، زانا هیچ سودێ لەو زانیاریە وەرناگرێ. خۆ ئەگەر نەزانێكیش نەی زانێ هیچ زیانێ بە نەزانیەكەی ناگەیەنێت والله أعلم[2]. ئیمامی ڕازی و كەسانی تریش هەر ئەمەیان پەسەند كردووە و هەر ئەویش ڕاستە. پاشان خودای گەورە ئەفەرموێت:

---

[1] الطبری /١/٥١٤.

[2] الطبری /١/٥٣٠ ص٥٣.

﴿فَأَزَلَّهُمَا ٱلشَّيْطَٰنُ عَنْهَا﴾ شەیتان هەڵی خەڵەتاندن. هەڵدەگرێ ئەو زەمیرە لە (عنها) بگەڕێتەوە بۆ بەهەشت، ئەو کاتە مانای دەقەکە وەك عاسمی کوڕی بەهدەلە خوێندویەتیەوە ﴿فَأَزَلَّهُمَا ٱلْعَلِيمُ﴾ واتە: پێ دان و دوری خستنەوە[1]. هەڵیش دەگرێ ئەو زەمیرە بگەڕێتەوە بۆ نزیکترینیان لەو دوانە کە باس کران کە درەختەکەیە، ئەو کاتە وەك ئەوەی لێدێت وەك حەسەن و قەتادە دەڵێن: واتە: بەهۆی ئەو تاوانەوە[2]. بەم پێیە دەقەکە وای لێدێ ﴿فَأَزَلَّهُمَا ٱلشَّيْطَٰنُ عَنْهَا﴾ بەهۆی ئەوەوە شەیتان هەڵی خەڵەتاندن. وەك خودای گەورەلە ئایەتێکیترا ئەفەرموێت: ﴿يُؤْفَكُ عَنْهُ مَنْ أُفِكَ﴾[3] لە قورئان دەتەکێتەوە هەرکەسێ تەکێنراوەتەوە. هەر بۆیە خودای گەورە ئەفرموێت: ﴿فَأَخْرَجَهُمَا مِمَّا كَانَا فِيهِ﴾ لەبەهەشت دەری پەڕاندن. واتە: لەو پۆشاك و شوێنە فراوان و خۆش و بژێویە باش و جوان و چاکە دوری خستنەوە: ﴿وَقُلْنَا ٱهْبِطُوا۟ بَعْضُكُمْ لِبَعْضٍ عَدُوٌّ ۖ وَلَكُمْ فِى ٱلْأَرْضِ مُسْتَقَرٌّ وَمَتَٰعٌ إِلَىٰ حِينٍ﴾ وتمان: دابەزنە خوارەوە، خۆتان دوژمنی خۆتانن، تا ماوەیەکی دیاری کراو لەسەر زەمین ڕای ببوێرن. واتە: شوێن و ڕۆزی و ماوەی تەمەنتان تا ماوەیەك کە بۆتان دیاری کراوە ژیان بەسەر بەرن، پاشان ڕۆژی قیامەت دێت.

## ئادەم سەلامی خوای لێبێت بالأی بەرز بووە

ئیبنو ئەبی حاتەم ڕیوایەتی کردووە لە ئوبەی کوڕی کەعبەوە ئەڵێت: پێغەمبەری خودا(ﷺ) فەرمویەتی: خودا ئادەمی دروست کرد پیاوێکی بالأ بەرز بوو. قژی سەری زۆر بوو. وەك دار خورمایەکی بەرز وابوو، کاتێ کە تامی درەختەکەی کرد، جل و بەرگەکەی لەبەری کەوتە خوارەوە، یەکەم شتێ کە لێیەوە دەرکەوت شەرمی بوو (عەورەت)، کاتێ کەسەیری شەرمی خۆی کرد، بە توندی خۆی دەخستە ناو بەهەشتەوە، درەختێ قژی گرت و پێیەوە گیرایەوە، لەو کاتەدا خودای ڕەحمان بانگی کرد، ئەی ئادەم! لە من ڕادەکەی کاتێ کە گوێی لە قسەی ڕەحمان بوو، وتی: ئەی پەروەردگارم! نەخەیر بەڵام شەرم دەکەم[4].

## ئادەم ساتێك لە ڕۆژ لە بەهەشتا مایەوە

حاکیم ڕیوایەتی کردووە لە ئیبنو عەباسەوە ئەڵێت: لە بەهەشتا نەمایەوە لە نوێژی عەسرەوە تا خۆر ئاوا بوون نەبێ. واتە: لە نوێژی عەسرەوە تا خۆر ئاوابون مایەوە. پاشان ئەڵێت: ئەم فەرمودە

---

[1] ابن ابی حاتم/١/١٢٨.

[2] ابن ابی حاتم /١/١٢٨/١٢٩.

[3] الذاريات ٩.

[4] ابن ابی حاتم /١/١٢٩ ص٥٤.

سەحیحە لەسەر مەرجی بوخاری و مسلم بەڵام ئەوان نەیان هێناوە[1]. ئیبنو ئەبی حاتەم ڕیوایەتی کردووە لە ئیبنو عەباسەوە ئەڵێت: ئادەم دابەزێنرایە خوارەوە بۆ زەمینێك پێی دەوترا دەحنا لە نێوان مەککە و تائیف دا[2]. وە لە حەسەنی بەسریەوە ئەڵێت: ئادەم سەلامی خوای لێبێ لە هیند دابەزێنرا. حەوایش لە جەدە، ئیبلیسیش لە دەستومیسان لە نزیك بەسرەوە بە چەند میلێك، ماریش لە ئەسفەهان دابەزێنرا. ئیبنو ئەبی حاتەم ڕیوایەتی کردووە[3]. موسلیم و نەسائی ڕیوایەتیان کردووە لەئەبو هورەیرەوە ئەڵێت: پێغەمبەری خودا(ﷺ) فەرمویەتی: چاکترین ڕۆژێ خۆری تیا هەڵاتبێ ڕۆژی هەینیە تێیدا ئادەم دروستکراو تێیدا خرایە بەهەشت، تێیدا وەدەر خرا[4].

### گومانێك و وەڵام دانەوەی

ئەگەر وترا: ئەگەر ئەو بەهەشتەی کە ئادەمی لێ وەدەرنرا لە ئاسماندا بووە وەك جمهوری زانایان دەڵێن: کەواتە ئیبلیس چۆن توانی بچێتە ناو بەهەشت، کە لە بەهەشت دەرکرا بەدەر کردنێکی قەدەری؟ وەڵامەکەی؟ ئەمە خۆی ئەوانە کردویانە بە بەڵگە کە دەڵێن: ئەو بەهەشتەی کە ئادەمی تێدا بووە لە زەمینا بووە نەك لە ئاسمانا، وەك لە سەرەتای کتێبەکەماندا (البدایه والنهایه) باسمان کردووە. بەڵام جمهور بە چەند وەڵامێك وەڵامیان داوەتەوە، لەو وەڵامانە: بێگومان ڕێگری لێکراوە بە ڕێزەوە بچێتە ناو بەهەشت، بەڵام بە بێڕێزی و سوکایەتی پێکردن و دزیەوە ڕێگری لێنەکراوە. هەر بۆیە هەندێ لە زانایان دەڵێن: وەك لە تەوراتا هاتووە ئیبلیس لە دەمی مارێکەوە چۆتە ناو بەهەشت، هەندێکی تر دەڵێن: هەڵدەگرێ وەسوەسەی بۆ دروست کردبن شەیتان خۆی لە دەرەوەی بەهەشتەوە بوبێ، هەندێ تر دەڵێن: هەڵدەگرێ شەیتان هەر لەسەر زەمینەوە وەسوەسەی بۆدروست کردبن ئەوان لەئاسمان بوبن ئەمە قسەی زەمەخشەری و کەسانی تریشە.

﴿فَتَلَقَّىٰٓ ءَادَمُ مِن رَّبِّهِۦ كَلِمَٰتٍ فَتَابَ عَلَيْهِ ۚ إِنَّهُۥ هُوَ ٱلتَّوَّابُ ٱلرَّحِيمُ ﴿٣٧﴾﴾

### پەشیمان بوونەوەی ئادەم و دوعاکەی

خودای گەورە ئەفەرموێت: ﴿فَتَلَقَّىٰٓ ءَادَمُ مِن رَّبِّهِۦ كَلِمَٰتٍ فَتَابَ عَلَيْهِ ۚ إِنَّهُۥ هُوَ ٱلتَّوَّابُ ٱلرَّحِيمُ﴾ ئادەم لەلایەن پەروەر دگاریەوەچەند وشەیەکی پێگەیشت، ئەوسا تۆبەکەی قبولّ کرد، هەرخۆیەتی لە پەشیمانان دەبورێ و دلۆڤانە. دەڵێت: ئەم وشانە تەفسیر دەکرێ بەم ئایەتە کە خودای گەورە ئەفەرموێت:

---

[1] الحاکم /٢/٥٤٢.
[2] ابن ابی حاتم/١/١٣١.
[3] ابن ابی حاتم /١/١٣١.
[4] مسلم /٢/٥٨٥/، النسائی/٣/٩٠.

﴿قَالَا رَبَّنَا ظَلَمْنَآ أَنفُسَنَا وَإِن لَّمْ تَغْفِرْ لَنَا وَتَرْحَمْنَا لَنَكُونَنَّ مِنَ ٱلْخَـٰسِرِينَ﴾[1] وتیان: ئەی پەروەردگارمان، ناهەقیمان لە خۆمان کرد، ئەگەر تۆ لێمان نەبوری و بەزەیت پێماندا نەیە، بێگومان لە زیان بارانین. ئەمە ڕیوایەت کراوە لە موجاهید و سەعیدی کوڕی جوبەیر و ئەبولعالیە و کوڕی ئەنەس و حەسەن و قەتادە و موحەمەدی کوڕی کەعبی قورەزی خالیدی کوڕی مەعدان و عەتای خۆراسانی و عەبدولرەحمانی کوڕی زەیدی ئەسلەمەوە[2]. سوددی دەڵێت: لەو کەسانەوە بۆیان گێڕاوەتەوەلە ئیبنو عەباسەوە: ﴿فَتَلَقَّىٰٓ ءَادَمُ مِن رَّبِّهِۦ كَلِمَـٰتٍ﴾ ئادەم سەلامی خوای لێبێ لە پەروەردگاریەوە چەند وشەیەکی پێگەیشت، وتی: ئادەم سەلامی خوای لێبێ وتی: ئەی پەروەردگارم ئایا تۆ بە دەستت دروستت نەکردم؟ پێی دەوترێ: بەڵێ، وە لە ڕۆحی خۆت نەتکرد بە بەرمدا؟ پێی دەوترێ: بەڵێ، وە پژمیم فەرموت بەر بەزەیی خودا کەوی و بەزەیت پێش تورەیت کەوتووە؟ پێی دەوترێ: بەڵێ، وە لەسەرت نوسیوم کە ئەم کارە بکەم؟ پێی دەوترێ: بەڵێ، وتی: ئایا دیت تەوبەم کرد دەم گێڕیتەوە بۆ بەهەشت؟ ‌فەرموی بەڵێ[3]. هەر بەو جۆرە عەوفی و سەعیدی کوڕی جوبەیر و مەعبەد ڕیوایەتیان کردووە لە ئیبنو عەباسەوە[4]. حاکیم لە موستەدرەکەکەیدا لە فەرودەکەی ئیبنو جەریرەوە ڕیوایەتی کردووە لە ئیبنو عەباسەوە. ئەڵێت سەنەدەکانی سەحیحە بەلاَم بوخاری و موسلیم نەیان هێناوە[5].

پاشان خودای گەورە ئەفەرموێت: ﴿إِنَّهُۥ هُوَ ٱلتَّوَّابُ ٱلرَّحِيمُ﴾ هەر خۆیەتی لە پەشیمانان دەبورێ و دلۆڤانە. واتە: دەبورێ لەوانەی تەوبە دەکەن و دەگەڕێنەوە بۆ لای. وەك ئەم ئایەتانە کە خودای گەورە دەفەرموێت: ﴿ أَلَمْ يَعْلَمُوٓا۟ أَنَّ ٱللَّهَ هُوَ يَقْبَلُ ٱلتَّوْبَةَ عَنْ عِبَادِهِۦ﴾[6] چۆن دەبێ نەیان زانیبێ خودا تەوبە لە عەبدی خۆی قبولْ دەکا. وە ئەفەرموێت: ﴿ وَمَن يَعْمَلْ سُوٓءًا أَوْ يَظْلِمْ نَفْسَهُۥ﴾[7] هەرکەسێك کاێکی نالەبار یان غەدرێك لە خۆی بکا، پاشان لە خودا داوا بکا بیبەخشێ دەبینێ خودا لێی دەبورێ و دلۆڤانە. وە ئەفەرموێت: ﴿ وَمَن تَابَ وَعَمِلَ صَـٰلِحًا﴾[8] هەرکەسێ تۆبە بکا و ئاکاری چاك ڕەچاو بکا، بەڕاستی

---

[1] الاعراف ٢٣.

[2] ابن ابی حاتم/١/١٣٦، الطبری/١/٥٤٣/٥٤٦.

[3] الطبری /١/٥٤٣/لاوازە ص٥٤.

[4] الطبری /١/٥٤٢.

[5] الحاکم/٢/٥٤٥.

[6] التوبة ١٠٤.

[7] النساء ١١٠.

[8] الفرقان ٧١.

دەگەڕێتەوە بۆ لای خودا. چەندین ئایەتی تریش کە بەڵگەن لەسەر ئەوە کە خودا لە تاوان دەبورێ و هەرکەسێ تەوبە بکا لێی قبوڵ دەکا، ئەمەیش لە سۆز و بەزەیی خودا خۆیەتی دەربارەی عەبدەکانی هیچ شتێ بۆ پەرستن ناشێ جگە لە ئەو هەر ئەوە لێبووردە و دلۆڤانە.

﴿قُلْنَا اهْبِطُوا مِنْهَا جَمِيعًا فَإِمَّا يَأْتِيَنَّكُمْ مِنِّي هُدًى فَمَنْ تَبِعَ هُدَايَ فَلَا خَوْفٌ عَلَيْهِمْ وَلَا هُمْ يَحْزَنُونَ (٣٨) وَالَّذِينَ كَفَرُوا وَكَذَّبُوا بِآيَاتِنَا أُولَئِكَ أَصْحَابُ النَّارِ هُمْ فِيهَا خَالِدُونَ (٣٩)﴾

خودای گەورە فەرموێت: ﴿قُلْنَا اهْبِطُوا مِنْهَا جَمِيعًا فَإِمَّا يَأْتِيَنَّكُمْ مِنِّي هُدًى فَمَنْ تَبِعَ هُدَايَ فَلَا خَوْفٌ عَلَيْهِمْ وَلَا هُمْ يَحْزَنُونَ﴾ وتمان: گشتتان لە بەهەشت بڕۆنە خوارێ، ئەوسا ئەگەر لای منەوە ڕێنمونیەکتان بۆ هات، ئەوانی بکەونە شوێن ڕێنمونیەکەم، نە لەهیچ شتێ دەترسن،نە خەم دەخۆن. خودای گەورە لێرەدا ئاگاداری ئەدات بەوەی کی ئادەم و هاوسەرەکەی و ئیبلیسی پێ ترساندوە کاتێ کە لە بەهەشت دای بەزاندونەتە خوارێ، مەبەست پێی وەچەکانیشیانە: کە بەو زوانە کتێب ڕەوانە دەکا و پێغەمبەران دەنێرێ وەك ئەبولعالیە ئەڵێت: (الهدی)یانی: پێغەمبەران و کتێبەکانە[1] ﴿فَمَنْ تَبِعَ هُدَايَ﴾ هەرکەسێ شوێنی ڕێنمونیەکانی من کەوت. واتە: هەر کەسێ شوێنی ئەو فەرمانانە کەوت لەکتێبەکاندا ڕەوانە کراوەو ئەوی پێغەمبەران هێناویان: ﴿فَلَا خَوْفٌ عَلَيْهِمْ﴾ هیچ ترسێکیان لەسەر نیە. لەو شتانەی کە بەرەو ڕوویان دەبێتەوە لە ڕۆژی قیامەتدا: ﴿وَلَا هُمْ يَحْزَنُونَ﴾ نە خەم دەخۆن بۆ ئەو شتانەی لە دونیا لە دەستیان چووە. وەك لە سوورەتی طه دا خودای گەورە ئەفەرموێت: ﴿ قَالَ اهْبِطَا مِنْهَا جَمِيعًا بَعْضُكُمْ لِبَعْضٍ عَدُوٌّ فَإِمَّا يَأْتِيَنَّكُمْ مِنِّي هُدًى فَمَنِ اتَّبَعَ هُدَايَ فَلَا يَضِلُّ وَلَا يَشْقَى ﴾[2] وتی: هەردووکتان سەربەرەو ژوور بڕۆنە خوارەوە. سەرلەبەر دژی یەکترین، ئەگەر لەلایەن منەوە ڕێنمونیتان هاتە لا،ئەوسا هەر کەس ڕێگەی منی گرتە بەر، ئیتر نە ڕێ هەڵە دەکا، نە تووشی نەگبەتی دەبێ. ئیبنو عەباس ئەڵێت: لە دنیا گومڕا نابێ و لە ڕۆژی قیامەتیشدا بەدبەخت نابێ[3]. وە ئەفەرموێت: ﴿ وَمَنْ أَعْرَضَ عَنْ ذِكْرِي فَإِنَّ لَهُ مَعِيشَةً ضَنْكًا وَنَحْشُرُهُ يَوْمَ الْقِيَامَةِ أَعْمَى ﴾[4] هەرکەسێکیش بە ئامۆژگاری من نەکا، ژینی لە تەنگانەدایە و لە ڕۆژی قیامەتا بە کوێری لە گۆڕ دەری

---

[1] ابن ابی حاتم/١/١٣٩.

[2] طه ١٢٣.

[3] الطبری /١٨/٣٨٩ ص٥٤.

[4] طه ١٢٤.

دەهێنن. وەك لێرەیشدا ئەفەرموێت: ﴿وَٱلَّذِينَ كَفَرُواْ وَكَذَّبُواْ بِـَٔايَٰتِنَآ أُوْلَٰٓئِكَ أَصۡحَٰبُ ٱلنَّارِۖ هُمۡ فِيهَا خَٰلِدُونَ﴾ ئەوانەی کە بێ بڕوا بوون و نیشانەکانی ئێمەیان بە درۆ زانی ئەوانە هاودەمی ئاگرن تێدا دەمێننەوە بە هەتا هەتایی. واتە: بێ بڕانەوە هەر لە ناو ئاگرا دەبن هەرگیز لێی دەرناچن.

﴿يَٰبَنِيٓ إِسۡرَٰٓءِيلَ ٱذۡكُرُواْ نِعۡمَتِيَ ٱلَّتِيٓ أَنۡعَمۡتُ عَلَيۡكُمۡ وَأَوۡفُواْ بِعَهۡدِيٓ أُوفِ بِعَهۡدِكُمۡ وَإِيَّٰيَ فَٱرۡهَبُونِ ﴿٤٠﴾ وَءَامِنُواْ بِمَآ أَنزَلۡتُ مُصَدِّقٗا لِّمَا مَعَكُمۡ وَلَا تَكُونُوٓاْ أَوَّلَ كَافِرِۭ بِهِۦۖ وَلَا تَشۡتَرُواْ بِـَٔايَٰتِي ثَمَنٗا قَلِيلٗا وَإِيَّٰيَ فَٱتَّقُونِ ﴿٤١﴾﴾

**هەڵنانی نەوەی ئیسرائیل کە بچنە ناو ئاینی ئیسلام**

خودای گەورە فەرمان دەکا بە نەوەی ئیسرائیل کە بچنە ناو ئاینی ئیسلام و شوێن موحەمەد کەون(ﷺ) دەیان هێنێتە جۆش و هانایان ئەدا بە هێنانی ناوی ئیسرائیلی باوکیان کە پێغەمبەری خودا سەلامی خوای لێبێ یەعقوبە و ئەفەرموێت: ﴿يَٰبَنِيٓ إِسۡرَٰٓءِيلَ﴾ ئەی نەوەی ئیسرائیل، واتە: ئەی نەوەی عەبدی پیاوچاکی بە فەرمانی خودا، سادەی ئێوەش وەك باوکتان بکەن لە گەڕان بە شوێنی هەقدا، وەك دەڵێت: ئەی کوڕی میهرەبان ئەو کارە بکە. ئەی کوڕی جوامێر ڕووبەڕووی پاڵەوانەکان ببەوە. ئەی کوڕی زانا بگەڕێ بە شوێن زانستا و لەم بابەتە. وە هەر دیسان بەم شێوەیە خودای گەورە ئەفەرموێت: ﴿ذُرِّيَّةَ مَنۡ حَمَلۡنَا مَعَ نُوحٍۚ إِنَّهُۥ كَانَ عَبۡدٗا شَكُورٗا﴾[1] ئەی وەچەی ئەوانەی کە لەگەڵ نووحا هەڵمان گرتن، بەراستی ئەو عەبدێکی شوکرانە بژێر بوو.

**ئیسرائیل نازناوی یەعقوب بوو سەلامی خوای لێبێ**

ئیسرائیل نازناوی یەعقوبە بە پێی ئەو بەڵگە کە ئەبو داودی تیالیسی ڕیوایەتی کردووە لە عەبدڵڵای کوڕی عەباسەوە ئەڵێت: کۆمەڵێ لە جوولەکەکان لە خزمەت پێغەمبەردا بوون(ﷺ) فەرمووی پێیان: ئایە دەزانن کە ئیسرائیل یەعقوبە؟ وتیان ئەی خودایە بەڵێ، پێغەمبەر(ﷺ) فەرموی: ئەی خودایە تۆ شاهید بە[2]، تەبەری ڕیوایەتی کردووە لە عەبدڵڵای کوڕی عەباسەوە ئەڵێت: ئیسرائیل وەك ئەوەیە کە تۆ بڵێیت عەبدوالله[3].

**بەهرەکانی خودا لەسەر جوولەکە**

خودای گەورە ئەفەرموێت: ﴿ٱذۡكُرُواْ نِعۡمَتِيَ ٱلَّتِيٓ أَنۡعَمۡتُ عَلَيۡكُمۡ﴾ ئەی نەوەی ئیسرائیل لە بیر تان بێت چەندم چاکە لەگەڵ کردووە. موجاهید ئەڵێت: ئەو بەهرانەی کە خودا پێی داون و باسی کردوون و

---

[1] الاسراء ٣.

[2] الطبری /١/٥٥٣.

[3] أبو داود الطیالسی /٣٥٦/ص٥٥، سەنەدەکەی خراپ نیە.

غەیرەز ئەوانیش، وەك لەتكردنی بەرد و گەزۆ و شەلاقەی بۆ ناردن و لە بەندایەتی ئالی فیرعەون ڕزگاری كردن[1]. ئەبولعالیە ئەڵێت: لە بەمرەكانی خودا كە پێی داون ڕەوانە كردنی پێغەمبەران لە ناویاندا و ناردنی كتێب بۆیان[2]. منیش دەڵێم: ئەمە وەك ئەوەیە كە موسا دەفەرموێت پێیان: ﴿يَٰقَوۡمِ ٱذۡكُرُواْ نِعۡمَةَ ٱللَّهِ عَلَيۡكُمۡ إِذۡ جَعَلَ فِيكُمۡ أَنۢبِيَآءَ وَجَعَلَكُم مُّلُوكٗا وَءَاتَىٰكُم مَّا لَمۡ يُؤۡتِ أَحَدٗا مِّنَ ٱلۡعَٰلَمِينَ﴾[3] ئەی گەلەكەم دەبێ هەرگیز ئێوە ئەو چاكەیە لەبیر نەكەن كە خودا دەربارەی كردوون، كە ئەو هەموو پێغەمبەرەی هەر لەناو خۆتان بۆ ناردوون، چەندین پادشای لەناو خۆتان پەیدا كردووەو ئەو شتەی بە ئێوەی داوە، بە هیچ كەسی لەم دنیایەدا نەداوە. واتە: لە چەرخی خۆیاندا. موحەمەدی كوڕی ئیسحاق ڕیوایەتی كردووە لە ئیبنو عەباسەوە لەم ئایەتەدا: ﴿ٱذۡكُرُواْ نِعۡمَتِيَ ٱلَّتِيٓ أَنۡعَمۡتُ عَلَيۡكُمۡ﴾ لە بیرتان بێت چەندم چاكە لەگەڵ كردوون. واتە: بیری ئەو بەلایانە بكەنەوە بەسەر خۆتان و باب و باپیرانتانەوە، كاتێ كە ڕزگاری كردن لە دەستی فیرعەون و هۆزەكەی.

## ئاگادار كردنەوەی جوولەكە بەو پەیمانەی خودا لێی وەرگرتبوون

خودای گەورە ئەفەرموێت: ﴿وَأَوۡفُواْ بِعَهۡدِيٓ أُوفِ بِعَهۡدِكُمۡ﴾ پەیمانی من بەجێ بێنن، منیش پەیمانێ پێم داون بەجێی دێنم. واتە: ئەو پەیمانەی كە من لێم وەرگرتن وخستمە گەردنتان بۆ پێغەمبەر(ﷺ) كاتێ كە ڕەوانە كرا بۆتان، منیش ئەو پەیمانەتان بۆ بەجێ دێنم كە بڕواتان پێ كرو شوێنی كەوتن ئەو كۆت و زنجیرەی كە لە گەردنتانا بوو بە هۆی ئەو گوناهەوە كە خۆتان هۆكای بوون[4]. حەسەنی بەسریش هەر وای وتووە[5]. وە خودای گەورە ئەفەرموێت: ﴿وَلَقَدۡ أَخَذَ ٱللَّهُ مِيثَٰقَ بَنِيٓ إِسۡرَٰٓءِيلَ وَبَعَثۡنَا مِنۡهُمُ ٱثۡنَيۡ عَشَرَ نَقِيبٗاۖ وَقَالَ ٱللَّهُ إِنِّي مَعَكُمۡۖ لَئِنۡ أَقَمۡتُمُ ٱلصَّلَوٰةَ وَءَاتَيۡتُمُ ٱلزَّكَوٰةَ وَءَامَنتُم بِرُسُلِي وَعَزَّرۡتُمُوهُمۡ وَأَقۡرَضۡتُمُ ٱللَّهَ قَرۡضًا حَسَنٗا لَّأُكَفِّرَنَّ عَنكُمۡ سَيِّـَٔاتِكُمۡ وَلَأُدۡخِلَنَّكُمۡ جَنَّٰتٖ تَجۡرِي مِن تَحۡتِهَا ٱلۡأَنۡهَٰرُ﴾[6] خودا لەگەڵ نەوەی ئیسرائیل پەیمانی بەست، هەر لەخۆیان دوازدە كەسمان بۆ بەرپرسیان هەڵبژارد وخودا فەرموی: بەڕاستی من لەگەڵ ئێوەم ئەگەر ئێوە لەسەر نوێژ و

---

[1] الطبري /١/٥٥٦.

[2] الطبري /١/٥٥٦.

[3] المائدة ٢٠.

[4] الطبري /١/٥٥٥ ص٥٦.

[5] الطبري /١/١٠٩.

[6] المائدة ١٢.

زەکات دان هەمیشە بەردەوام بن، بە پێغەمبەرەکانیشم باوەڕتان بێ و قەدریان لای ئێوە هەبێ و ماڵی خۆتان بە قەرز بدەن بە خودا. ئەوا منیش کارە ناڵەبارو خراپەکانتان پاك و خاوێن دەکەمەوە و دەتانبەمە ناو باغاتێك جۆباریان بەبەردا دەڕوا. هەندێکی تر وتویانە ئەو خودایەی کە پەیمانی لێوەرگرتن لە تەوراتا کە لەمەو بەدوا لە نەوەی ئیسماعیل پێغەمبەرێکی مەزن ڕەوانە دەکا، هەموو گەلان شوێنی دەکەون و بەرفەرمانی دەبن. مەبەست پێی موحەمەدە(ﷺ) هەرکەسێ شوێنی کەوت خودا لە تاوانەکانی دەبورێ و دەیخاتە ناو بەهەشت، دووجار پاداشتی ئەداتەوە. ڕازی مژدەی زۆری هێناوە لەلایەن پێغەمبەرانەوەسەلامی خوایان لێبێ دەربارەی موحەمەد(ﷺ). ئەبولعالیە ئەڵێت: ﴿وَأَوۡفُواْ بِعَهۡدِيٓ﴾ پەیمانی من بەجێ بێنن. واتە: بەڵێنی لە عەبدەکانی وەرگرتووە بۆ ئاینی ئیسلام کە شوێنی کەون[1]. زەحاك ئەڵێت: لە ئیبنو عەباسەوە﴿أُوفِ بِعَهۡدِكُمۡ﴾ ئەڵێت: لێتان ڕازی دەبم و دەتانخەمە بەهەشت[2]. سوددی و زەحاك و ئەبولعالیە و ڕەبیعی کوڕی ئەنەسیش هەروایان وتووە. وە خودای مەزن ئەفەرموێت: ﴿وَإِيَّٰيَ فَٱرۡهَبُونِ﴾ وە هەر تەنیا لە خۆم بترسن[3]. ئەمە قسەی ئەبولعالیە و سوددی و ڕەبیعی کوڕی ئەنەس و قەتادەیە. ئیبنو عەباس ئەڵێت: ﴿وَإِيَّٰيَ فَٱرۡهَبُونِ﴾ واتە: بترسن لەو بەڵانەی کە دابەزیە سەریان و باپیرانتان کە دەبەزێتە سەر ئێوەش وەك گۆڕینی دەم و چاوو شتی تر کە خۆتان دەزانن ئەمە گواستنەوەیە لە مژدە دانەوە بۆ ترساندن، بەڵکو بگەڕێنەوە بەرە و هەق و شوێن پێغەمبەر کەون و(ﷺ) پەندو ئامۆژگاری لە قورئان وەرگرن و پەیڕەوی فەرمانەکانی بکەن و بڕوا بێنن بە هەواڵەکانی، خودا مەیلی خۆیەتی هەرکەسێ شارەزا دەکا بۆ سەر ڕاستە ڕێ. هەر بۆیە ئەفەرموێت: ﴿وَءَامِنُواْ بِمَآ أَنزَلۡتُ مُصَدِّقٗا لِّمَا مَعَكُمۡ﴾ بڕواتان هەبێ بەوەی کە ناردومەتە خوار، کە ئەمەش بەڕاست دەزانێ وا ئێستا لەلای ئێوەیە. مەبەست پێی ئەو قورئانەیە کە بۆ موحەمەد(ﷺ) هاتۆتە خوارەوە کە پێغەمبەرێکی نەخوێندەوارە و مژدەدەرو ترسێنەر و چرای ڕووناکە، هەمووی هەقە و لەلایەن خوداوەیە. تەورات و ئینجیلیش بە ڕاست دەزانێ و بڕوای پێی هەیە. ئەبولعالیە وتی لەم ئایەتەدا کە خودای گەورە ئەفەرموێت: ﴿وَءَامِنُواْ بِمَآ أَنزَلۡتُ مُصَدِّقٗا لِّمَا مَعَكُمۡ﴾ بڕواتان هەبێ بەوەی کە ناردوومەتە خوار. کە ئەمەش بە ڕاست دەزانێ، دەڵێ: ئەی کۆمەڵی ئەهلی کتێب بڕواتان هەبێ بەوەی کە لەلای خۆتان کە دەڵێت، چونکە ئێوە ناوی موحەمەد(ﷺ) لە ئینجیل و تەوراتا لەلاتان

---

[1] الطبری /١/٥٥٨ ص٥٦.
[2] ابن ابی حاتم /١/١٤٣.
[3] الطبری /١/٥٦٠.

نوسراوە. هەر بەم شێوەیە ڕیوایەت کراوە لە موجاهید و ڕەبیعی کوڕی ئەنەس و قەتادەوە[1]. خودای گەورە ئەفەرموێت: ﴿وَلَا تَكُونُوٓا۟ أَوَّلَ كَافِرٍۭ بِهِۦ﴾ مەبنە پێشەنگی ئەوانەی حاشا لەم کتێبە دەکەن. ئیبنو عەباس ئەڵێت: ئێوە مەبنە یەکەم کەسێ کە بڕوای پێناکەن، کە ئێوە ئەو شارەزایەتان هەیە کە خەڵکی تر نیەنتی[2]. جگە لە ئێوە. ئەبو عالیە ئەڵێت: ئەفەرموێت: ئێوە یەکەمین کەس مەبن کە بڕوا بە موحەمەد(ﷺ) ناکەن، واتە: لە جنسی ئێوە کە ئەهلی کتێب پاش ئەوە کە بیستان ڕەوانە کراوە[3]. حەسەن و سوددی و ڕەبیعی کوڕی ئەنەسیش هەروایان وتووە[4]. ئیبنو جەریر دەڵێ ئەو زەمیرە لە ﴿بِمَآ أَنزَلْتُ﴾ دەگەڕێتەوە بۆ قورئان کە لە پێشەوە باسمان کرد. هەردوو قسەکە ڕاستن و پەیوەندن بە یەکەوە، چونکە هەرکەسێ بڕوای بە قورئان نەبێ بڕواشی بە موحەمەد نیە(ﷺ) هەرکەسیش بڕوای بە موحەمەد نەبێ (ﷺ) بڕواشی بە قورئان نیە. ﴿أَوَّلَ كَافِرٍۭ بِهِۦ﴾ مەبنە پێشەنگی ئەوانەی کە بڕوایان پێنیە لەنەوەی ئیسرائیل، چونکە خوانە ناسانی قورەیش و خەڵکێکی زۆر لە عەرەبەکان بڕوایان پێنەهێناوە. واتە: ئێوەش لەنەوەی ئیسرائیل مەبنە پێشەنگ لە بڕوا پێنەکردنیدا بێگومان جولەکەکانی مەدینە یەکەم کەس بوون کە ڕووی وتاریان تێکرا بە قورئان ئەوە دەگەیەنێ کە یەکەمین کەس دەبن بڕوایان بە قورئان نەکردووە. پاشان خودای گەورە ئەفەرموێت: ﴿وَلَا تَشْتَرُوا۟ بِـَٔايَٰتِى ثَمَنًا قَلِيلًا﴾ ناشێ نیشانەکانی من بە نرخێکی کەم بفرۆشن، بیدەن بە دونیا و ئارەزوەکانی دونیا کە زۆر کەمن و نامێنێ. ﴿وَإِيَّٰىَ فَٱتَّقُونِ﴾ سا هەر لەخۆم ترستان هەبێ. ئیبنو ئەبی حاتەم ڕیوایەتی کردووە لە تەلقی کوڕی حەبیبەوە ئەڵێت: لە خوا ترس (التقوی) ئەوەیە کار بە فرمانی خودا بکەی بە هیوای بەزەیی خودا لەسەر ڕوناکی لەلای خوداوە، واز لە تاوان بێنی لەسەر ڕوناکی لەلای خوداوە و ترسلن لە تۆڵەی خودا[5]. ﴿وَإِيَّٰىَ فَٱتَّقُونِ﴾ یانی: خودای گەورە هەڕەشەیان لێدەکا لەسەر ئەوەی کە ئەو هەقە دەشارنەوەو بە پێچەوانەیەوە کار دەکەن و دژایەتی پێغەمبەر (ﷺ)دەکەن.

﴿وَلَا تَلْبِسُوا۟ ٱلْحَقَّ بِٱلْبَٰطِلِ وَتَكْتُمُوا۟ ٱلْحَقَّ وَأَنتُمْ تَعْلَمُونَ ﴿٤٢﴾ وَأَقِيمُوا۟ ٱلصَّلَوٰةَ وَءَاتُوا۟ ٱلزَّكَوٰةَ وَٱرْكَعُوا۟ مَعَ ٱلرَّٰكِعِينَ ﴿٤٣﴾﴾

---

[1] ابن ابی حاتم /١٤٥/١ ص٥٦.
[2] ابن ابی حاتم /١٤٥/١.
[3] ابن ابی حاتم /١٤٥/١.
[4] ابن ابی حاتم /٤٥/١.
[5] ابن ابی حاتم /١٤٧/١.

## قەدەغەکردنی شاردنەوەی هەق و داپۆشینی

خودای گەورە قەدەغەی کردووە لە جوولەکە، کە هەق بپێچن بە پڕوپوچەوە و ساختە کاری تیا بکەن و هەق بشارنەوەو فەرمانی پێداون کە دوور کەونەوە لە شتی پڕوپوچ و ئەفەرموێت: ﴿وَلَا تَلْبِسُوا ٱلْحَقَّ بِٱلْبَٰطِلِ وَتَكْتُمُوا ٱلْحَقَّ وَأَنتُمْ تَعْلَمُونَ﴾ ڕاستی و ڕەوا بە ناڕەوا دامەپۆشن حاشا لەو ڕاستە مەکەن کە خۆتان ناسیوتانە. خودای گەورە لێرە دوو شتی لێقەدەغە کردوون، فەرمانی پێداون کە ڕاستی دەرخەن و بە ئاشکرا بیڵێن. هەر بۆیە زەححاك لە ئیبنو عەباسەوە ئەڵێت: ﴿وَلَا تَلْبِسُوا ٱلْحَقَّ بِٱلْبَٰطِلِ﴾ واتە: هەق و ناهەق و ڕاستی و درۆ تێکەڵ مەکەن[1]. قەتادە ئەڵێت: ﴿وَلَا تَلْبِسُوا ٱلْحَقَّ بِٱلْبَٰطِلِ﴾ واتە: جوولەکەیی و گاوری مەپێچن بە ئیسلامەوە: ﴿وَأَنتُمْ تَعْلَمُونَ﴾ خۆشتان دەزانن کە ئاینی خودا ئیسلامەو گاوری و جوولەکەیش بیدعەیە و لەلایەن خوداوە نیە[2]. هەر بەم جۆرەیش ڕیوایەت کراوە لە حەسەنی بەسریەوە[3]. موحەمەدی کوڕی ئیسحاق ڕیوایەتی کردووە لە ویبنو عەباسەوە: ﴿وَتَكْتُمُوا ٱلْحَقَّ وَأَنتُمْ تَعْلَمُونَ﴾ واتە: ئەو زانیاریانەی کە لەلاتانە دەربارەی پێغەمبەرەکەم و ئەوەی پێی ڕەوانە کراووە،کە لای خۆتان دەیبین نوسراوە لەو کتێبانەدا لەبەر دەستی خۆتاندایە و دەیزانن[4]. منیش دەڵێم: هەڵدەگرێ ئاوا بێ ئێوە خۆتان دەزانن کە چ زیانێکی گەورە بە خەڵکی دەکا لە گومڕاکردنی خەڵکی لەسەر ڕێی ڕاست و بەرەو ئاگربردنیان. ئەگەر ئەوانە شوێنی ئەو پڕوپوچەی ئێوە کەوتن کە تێکەڵی هەقتان کردووە بۆ هەڵخەڵەتاندنیان. ڕونکردنەوەیانی ئاشکرا کردن پێچەوانەکەیشی شاردنەوەو تێکەڵ کردنی هەق بە ناهەق. پاشا خودای گەورە ئەفەرموێت: ﴿وَأَقِيمُوا ٱلصَّلَوٰةَ وَءَاتُوا ٱلزَّكَوٰةَ وَٱرْكَعُوا مَعَ ٱلرَّٰكِعِينَ﴾ نوێژ بکەن و زەکات بدەن، لەگەڵ کرنوش بەرەکاندا کڕنوش بەرن. موقاتیل ئەڵێت: خودای گەورە ئەفەرموێت بە ئەهلی کتێب: ﴿وَأَقِيمُوا ٱلصَّلَوٰةَ﴾ نوێژ بکەن. واتە: لەگەڵ پێغەمبەر(ﷺ) نوێژ بکەن: ﴿وَءَاتُوا ٱلزَّكَوٰةَ﴾ زەکات بدەن. فەرمانی پێداون کە زەکات بدەن بە پێغەمبەر (ﷺ): ﴿وَٱرْكَعُوا مَعَ ٱلرَّٰكِعِينَ﴾ وە فەرمانی پێداون کە لەگەڵ ئومەتی

---

[1] الطبری /١/٥٦٩.

[2] ابن ابی حاتم /١/١٤٧.

[3] ابن ابی حاتم /١/١٤٧.

[4] ابن ابی حاتم/١/١٤٨.

پێغەمبەر(ﷺ) کڕنوش بەرن. واتە: ئەفەرموێت: لەگەڵ ئەوان بن و وەك ئەوان بن[1]. خودای گەورە ئەفەرموێت: ﴿وَٱرۡكَعُواْ مَعَ ٱلرَّٰكِعِينَ﴾ لەگەڵ کڕنوش بەران کڕنوش بەرن. واتە: لەگەڵ خاوەنباوەڕان بن لە ئاکارە چاکەکانیاندا، وە لە چاکترین ئاکارەکانیان و تەواو ترینیان نوێژکرنە. زۆرێ لە زانایان ئەم ئایەتەیان کردووەتە بەڵگە لەسەر پابەند بوون بە کۆمەڵەوە.

﴿أَتَأۡمُرُونَ ٱلنَّاسَ بِٱلۡبِرِّ وَتَنسَوۡنَ أَنفُسَكُمۡ وَأَنتُمۡ تَتۡلُونَ ٱلۡكِتَٰبَۚ أَفَلَا تَعۡقِلُونَ ﴿٤٤﴾﴾

## هەڕەشەکردن لە ئەهلی کتێب لەسەر ئەوە کە فەرمان ئەدەن بە خەڵکی چاکە بکەنکەچی خۆیان پابەند نابن پێیەوە

خودای گەورە ئەفەرموێت: ﴿أَتَأۡمُرُونَ ٱلنَّاسَ بِٱلۡبِرِّ وَتَنسَوۡنَ أَنفُسَكُمۡ وَأَنتُمۡ تَتۡلُونَ ٱلۡكِتَٰبَۚ أَفَلَا تَعۡقِلُونَ﴾ ئایا ئێوە کە فەرمان بەو خەڵکە ئەدەن چاکە بکەن. خۆتان فەرامۆش دەکەن، لەگەڵ ئەوەیشا هەر خۆتان کتێب خوێندوون؟ دەی چیتانە تێناگەن؟ خودای گەورە ئەفەرموێت بە ئەهلی کتێب، ئەوە کەی شایستەی ئێوەیە کە فەرمان بە خەڵکی ئەدەن چاکە بکەن کەچی خۆتان لە بیر دەکەن و ئەوەی بە خەڵکی دەڵێن خۆتان نایکەن کەچی ئێوە لەگەڵ ئەوەیشا کتێب دەخوێننەوە، خۆتان دەزانن ئایە ئەو کارەتان پێچەوانەی فەرمانی خودا نیە؟ ﴿أَفَلَا تَعۡقِلُونَ﴾ دەی چیتانە تێناگەن. ئێوە ئاوا بە خۆتان دەکەن، بۆچی وشیارو بە ئاگا نابنەوەو هەڵناسن و چاو بکەنەوە، ئەمە وەك ئەوە وایە کە عەبدوڕەزاق ئەڵێت: لە موعەمەرەوە لە قەتادەوە لەم ئایەتەدا: ﴿أَتَأۡمُرُونَ ٱلنَّاسَ بِٱلۡبِرِّ وَتَنسَوۡنَ أَنفُسَكُمۡ﴾ ئایا ئێوە کە فەرمان بەو خەڵکە ئەدەن چاکە بکەن، خۆتانی لێ هەڵادەوێرن؟ وتی: نەوەی ئیسرائیل فەرمانیان ئەدا بە خەڵکی کە گوێڕایەڵی فەرمانی خودا بکەن و لێی بترسن و چاکە بکەن،کەچێ خۆیان بە پێچەوانەوە دەجووڵانەوە خودای گەورەیش سەرزەنشتی کردوون[2]. سوددیش هەروای وتووە. ئیبنو جورەیج ئەڵێت: ﴿أَتَأۡمُرُونَ ٱلنَّاسَ بِٱلۡبِرِّ﴾ ئایا فەرمان ئەدەن بەو خەڵکە کە چاکە بکەن. ئەهلی کتێب و دووڕوەکان فەرمانیان ئەدا بە خەڵکی کە نوێژ بکەن و ڕۆژوو بگرن. کەچی ئەوەی بە خەڵکیان دەوت خۆیان نەیان دەکرد. خودای گەورە سەرزەنشتی دەکردن لەسەر ئەوە. هەرکەسێ فەرمان بە چاکە بکا دەبێ خۆی لە خەڵکی زیاتر و چاکتر هەوڵی بۆ بدات[3]. موحەمەدی کوڕی ئیسحاق ڕیوایەتی کردووە لە ئیبنو عەباسەوە، ئەڵێت: ﴿وَتَنسَوۡنَ أَنفُسَكُمۡ﴾ خۆتانی لێ هەڵادەوێرن و ﴿وَأَنتُمۡ تَتۡلُونَ ٱلۡكِتَٰبَۚ أَفَلَا

---

[1] الكشاف /١/١٣٣ ص٥٧.

[2] عبدالرزاق /١/٤٤.

[3] الطبري /٢/٨ ص٥٧.

تَعۡقِلُونَ﴾ واتە: ئێوە ڕێگری لە خەڵکی دەکەن لەسەر خوانەناسی بەهۆی ئەو پێغەمبەرانە کە بۆتان هاتوون و ئەو بەڵێنەی لە تەوراتا هاتووە کەچی خۆتان هەڵادەوێرن و جیادەکەنەوە. واتە: ئێوە حاشا دەکەن لەو پەیمانەی کە تێدا هاتووە بۆتان دەبێ بڕواتان هەبێ بەو پێغەمبەرەی من و پەیمانەکەم دەشکێنن، حاشا دەکەن لەوەی دەیزانن لە کتێبەکەمدا[1]. مەبەست ئەوەیە، خودای گەورە زەمیان دەکا لەسەر ئەو ئاکارەیان، ئاگاداریان دەکاتەوە لەو هەڵەو تاوانەی دەربارەی خۆیان دەیکەن،کە فەرمان بە خەڵکی ئەکەن چاکە بکا و خۆیان نایکەن. مەبەست لە زەم کردنیاندا ئەوە نیە کە فەرمان بە چاکە دەکەن کەچی خۆیان پێی هەڵناسن، چونکە فەرمان بە چاکە کردن شتێکی چاکە، پێویستە لەسەر هەموو زانایەك پێی هەڵسێ، بەڵام پێویسترو چاکتر وایە کە زاناکەش خۆشی لەگەڵ ئەو خەڵکەدا بەو کارە هەڵسێ، خۆی لەوان جیا نەکاتەوە. وەك شوعەیب سەلامی خوای لێبێ وتی: ﴿وَمَآ أُرِيدُ أَنۡ أُخَالِفَكُمۡ إِلَىٰ مَآ أَنۡهَىٰكُمۡ عَنۡهُۚ إِنۡ أُرِيدُ إِلَّا ٱلۡإِصۡلَٰحَ مَا ٱسۡتَطَعۡتُۚ وَمَا تَوۡفِيقِيٓ إِلَّا بِٱللَّهِۚ عَلَيۡهِ تَوَكَّلۡتُ وَإِلَيۡهِ أُنِيبُ﴾[2] ئەگەر دژتان دەوەستێم و دەڵێم فلان کار مەکەن، خۆ نیازم ئەوە نیە خۆم بیکەم، نیازی من هەر ئەوەیە تا بتوانم کاروبارتان سامان بدەم بە ئاوات گەیشتنم هەر بە خوایە و خۆم بەو سپاردووە وبۆ لای ئەو دەگەڕێمەوە. هەموو فەرمان بە چاکە و چاکەکردنێ واجبە، هیچ کامیان بە ئەوی تریان لەسەر کەس ناکەوێ بە وتەی سەحیحی زانایانی پێشینە و پاشینەش. ئیمامی ئەحمەد ڕیوایەتی کردووە لە ئەبو وائیلەوە،ئەڵێت: وترا بە ئوسامە کە من لە پێشیەوە بووم: ئایە قسە لەگەڵ عوسمان ناکەی؟ وتی: ئێوە خۆتان دەبینن من قسەی لەگەلا ناکەم مەگین ئێوەی لێئاگادار دەکەم. من قسەم لەگەلا کردووە دەربارەی ئەو شتانەی لە نێوان خۆم و ئەودا بووە. بێ ئەوە دەرگای شتێ بکەمەوە کە پێم خۆش نیە یەکەم کەس بم بیکەمەوە، سوێند بە خوا من ناڵێم بە پیاوێ تۆ چاکترین کەسی. با بەرپرسیشم بوبێ. دوای ئەوەی بیستم لە پێغەمبەری خودا(ﷺ) ئەیفەرموو،وتیان چیت لێبیستووە کە ئەی فەرموو؟ وتی: بیستم ئەیفەرموو: پیاوێ دەهێنرێ فڕێ ئەدرێتە ناو ئاگرەوە لە ڕۆژی قیامەتا ڕیخۆڵەکانی دەردەپەڕێ و ئەیسوڕێننەوە، وەك کەر ئاشی دەگەڕێ،خەڵکی ناو ئاگر دەوری ئەدەن و دەڵێن: ئەی فلان! بۆچی ئەمەت بەسەر هاتووە؟ ئایاتۆفەرمانت پێنەئەداین بە چاکە کردن و ڕێگریت لێ نەدەکردین لە خراپە؟ دەڵێ: من فەرمانم پێدەکردن بە چاکە کردن، بەڵام خۆم نەم دەکرد، خراپەم لێقەدەغە دەکردن بەڵام خۆم دەکرد[3]. بوخاری و موسلیمیش ڕیوایەتیان کردووە[1]. ئیبراهیمی نەفەعی

---

[1] الطبری /٢/٧.

[2] هود ٨٨.

[3] أحمد/٥/٢٠٥ ص٥٧ سه حیحه.

ئەڵێت: من حەزم لە قسە کردن نیە لەبەر ئەم سێ ئایەتە: کە خودای گەورە ئەفەرمویت: ﴿أَتَأْمُرُونَ النَّاسَ بِالْبِرِّ وَتَنسَوْنَ أَنفُسَكُمْ﴾ ئایا ئێوە کە فەرمان دەکەن بەو خەڵکە کە چاکە بکەن، خۆتانی لێ مەلادەوێرن؟ وە ئەفەرمویت: ﴿يَا أَيُّهَا الَّذِينَ آمَنُوا لِمَ تَقُولُونَ مَا لَا تَفْعَلُونَ ۝ كَبُرَ مَقْتًا عِندَ اللَّهِ أَن تَقُولُوا مَا لَا تَفْعَلُونَ﴾[2] ئەی کۆمەڵی خاوەنباوەڕان، بۆ قسە دەکەن و کردەوەی لەگەڵدا نیە؟ خودا زۆر لەوە تورەیە کە ئێوە شتێك بڵێن و نەیکەن[3]. وە لەسەر زمانی شوعەیبیش ئەفەرمویت: ﴿وَمَا أُرِيدُ أَنْ أُخَالِفَكُمْ إِلَىٰ مَا أَنْهَاكُمْ عَنْهُ ۚ إِنْ أُرِيدُ إِلَّا الْإِصْلَاحَ مَا اسْتَطَعْتُ ۚ وَمَا تَوْفِيقِي إِلَّا بِاللَّهِ ۚ عَلَيْهِ تَوَكَّلْتُ وَإِلَيْهِ أُنِيبُ﴾[4] ئەگەر دژتان دەوەستم و دەڵێم فلان کار مەکەن، خۆ نیازم ئەوە نیە کە خۆم بیکەم، نیازە من هەر ئەوەیە تا دەتوانم کارو بارتان سامان بدەم، بە ئاوات گەیشتنیشم هەر بە خودایە و خۆم بەو سپاردووە و بەرەو ئەو دەگەڕێمەوە.

﴿وَاسْتَعِينُوا بِالصَّبْرِ وَالصَّلَاةِ ۚ وَإِنَّهَا لَكَبِيرَةٌ إِلَّا عَلَى الْخَاشِعِينَ ۝٤٥ الَّذِينَ يَظُنُّونَ أَنَّهُم مُّلَاقُو رَبِّهِمْ وَأَنَّهُمْ إِلَيْهِ رَاجِعُونَ ۝٤٦﴾

## هانا بردن بۆ خۆڕاگری و نوێژکردن

خودای گەورە ئەفەرمویت: ﴿وَاسْتَعِينُوا بِالصَّبْرِ وَالصَّلَاةِ ۚ وَإِنَّهَا لَكَبِيرَةٌ إِلَّا عَلَى الْخَاشِعِينَ﴾ بۆ خۆڕاگری و نوێژکردن هانا بەرن، کە ئەم کارە زۆر دژوارە مەگین هەر بۆ ئەو کەسانەی کە خۆیان بە زل نازانن. خودای گەورە فەرمان ئەدا بە عەبدەکانی ئەوانەی بە هیوای دنیا و قیامەتن بە هانا بردن بۆ خۆڕاگری و نوێژکردن، وەك موقاتیلی کوڕی عەیان لە تەفسیری ئەم ئایەتەدا ئەڵێت: هانا بەرن بۆ وەدەست هێنانی ڕۆژی دوایی بە خۆڕاگری لەسەر فەرزەکان و نوێژکردن. دەربارەی خۆڕاگری وتراوە: مەبەست پێی ڕۆژوو گرتنە[5]. موجاهیدیش هەر وای وتووە، قورتوبی و کەسانی تریش ئەڵێن: هەرلەبەر ئەوەیە ڕەمەزان ناو نراوە بە مانگی خۆڕاگری[6]. وەك فەرمودەیش ئاماژەی پێکردووە. وتراویشە: مەبەست لە خۆڕاگری واز هێنانە لە گوناه، بۆیە داویەتیە پاڵ عیبادەتەکان. بەرزترین پلەیان نوێژکردنە. ئیبنو

[1] فتح الباری /٦/٣٨١، مسلم/٤/٢٢٩١.

[2] الصف ٢-٣.

[3] القرطبی /١/٣٦٧.

[4] هود ٨٨.

[5] ابن ابی حاتم/١/١٥٤ ص٥٨.

[6] القرطبی /١/٣٧٢.

ئەبی حاتەم ڕیوایەتی کردووە لە عومەری کوڕی خەتابەوە ڕەزای خوای لێبێ ئەڵێت: خۆڕاگری دوو جۆرە، خۆڕاگری لەسەر بەلا و موسیبەت ئەوە چاکە. چاکتر لەوە خۆڕاگری لەسەر قەدەغەکراوەکانی خودا. وە ئەڵێت: وەك ئەم قسەی عومەرە ڕیوایەتیش کراوە لە حەسەنی بەسریەوە[1]. کە خودای گەورە ئەفەرموێت: ﴿وَٱلصَّلَوٰةِ﴾ نوێژ. بێگومان نوێژ مەزنترین یارمەتی دەرە بۆ مانەوەو بەردەوامی لەسەر کار، وەك ئەفەرموێت: ﴿ ٱتْلُ مَآ أُوحِىَ إِلَيْكَ مِنَ ٱلْكِتَٰبِ وَأَقِمِ ٱلصَّلَوٰةَ ۖ إِنَّ ٱلصَّلَوٰةَ تَنْهَىٰ عَنِ ٱلْفَحْشَآءِ وَٱلْمُنكَرِ ۗ وَلَذِكْرُ ٱللَّهِ أَكْبَرُ ﴾[2] ئەوەی بۆت بەڕێ کراوە لەم کتێبە بیخوێنەوەو نوێژ بکە، نوێژکردن مرۆڤ لە کاری ناشرین و ناڕەوا دەپارێزێ، یادی خودا گەورەترە. ئەو زەمیرە لە ﴿وَإِنَّهَا لَكَبِيرَةٌ﴾ دایە، دەگەڕێتەوە بۆ نوێژ. ئەمە قسەی موجاهیدە، ئیبنو جەریریش ئەم ڕایەی هەڵبژاردووە. هەڵیش دەگرێ بگەڕێتەوە بۆ دەقەکە کە وەسیەت کرنە بەو. وەك خودای گەورە لە بەسەرهاتی قاروونەدا ئەفەرموێت: ﴿ وَقَالَ ٱلَّذِينَ أُوتُوا۟ ٱلْعِلْمَ وَيْلَكُمْ ثَوَابُ ٱللَّهِ خَيْرٌ لِّمَنْ ءَامَنَ وَعَمِلَ صَٰلِحًا وَلَا يُلَقَّىٰهَآ إِلَّا ٱلصَّٰبِرُونَ ﴾[3] ئەوانەی شارەزاییان پێدرابوو دەیان ووت: هەی ماڵ وێران، هەرکەسێ باوەڕی بە خودا هەبێت و ئاکار چاك بێ، بەو خەلاتەی خودا دەیداتێ چاکترە و ئەو خەلاتەش هەر بەشی خۆڕاگرانە. وە ئەفەرموێت: ﴿وَلَا تَسْتَوِى ٱلْحَسَنَةُ وَلَا ٱلسَّيِّئَةُ ۚ ٱدْفَعْ بِٱلَّتِى هِىَ أَحْسَنُ فَإِذَا ٱلَّذِى بَيْنَكَ وَبَيْنَهُۥ عَدَٰوَةٌ كَأَنَّهُۥ وَلِىٌّ حَمِيمٌ ﴿٣٤﴾ وَمَا يُلَقَّىٰهَآ إِلَّا ٱلَّذِينَ صَبَرُوا۟ وَمَا يُلَقَّىٰهَآ إِلَّا ذُو حَظٍّ عَظِيمٍ﴾[4] چاکەو خراپە وەك یەك نین، تۆ هەمیشە وەلامی چاکتر بدەرەوە. ئەوسا کەسێ لەگەڵ تۆ دوژمنە دەبێتە دۆستی نزیك. ئەم کارەش هەر تووشی کەسانێ دەبێ کە بتوانن خۆڕاگر بن، هەرکەسیش ئەو کارەی تووشی بێ،دیارە زۆر بەختەوەرە. واتە: ئەم وەسیەتە تووشی کەسێ نابێ مەگین ئەوانەی کە خۆڕاگرن. چونکە ئەوانەی تووشی ئەم کارە دەبێن زۆر بەختەوەرن. بە هەموو هەڵسەنگاندنەکان خودای مەزن ئەفەرموێت: ﴿وَإِنَّهَا لَكَبِيرَةٌ﴾ یانی: گران و قورسە ﴿إِلَّا عَلَى ٱلْخَٰشِعِينَ﴾ مەگین ئەوانەی کە لە خوا ترسن خۆیان بە زل نازانن عەلی کوڕی ئەبو تەلحە لە ئیبنو عەباسەوە ئەڵێت: یانی: ئەوانەی بڕوایان هەیە بەوەی کە خودا

---

[1] ابن ابی حاتم/١/١٥٥.

[2] العنكبوت ٤٥.

[3] القصص ٨٠.

[4] فصلت ٣٤-٣٥.

ڕەوانەی کردووە[1]. پاشان خودای گەورە ئەفەرموێت: ﴿ٱلَّذِينَ يَظُنُّونَ أَنَّهُم مُّلَٰقُواْ رَبِّهِمْ وَأَنَّهُمْ إِلَيْهِ رَٰجِعُونَ﴾ ئەو کەسانەی سوور دەزانن توشی پەروەردگاریان دەبن و دەگەڕێنەوە بۆ لای خۆی. ئەمە تەواو کەری دەقەکەی پێش خۆیەتی. واتە: نوێژ یان ئەو وەسێتە زۆر قورس و گرانە: ﴿إِلَّا عَلَى ٱلْخَٰشِعِينَ ﴿٤٥﴾ ٱلَّذِينَ يَظُنُّونَ أَنَّهُم مُّلَٰقُواْ رَبِّهِمْ﴾ مەگین ئەوانەی کە لە خوا ترسن و چاك دەزانن کە دەچنە بەردەم خودای گەورە و لە ڕۆژی قیامەتا و ئامادە دەکرێن: ﴿وَأَنَّهُمْ إِلَيْهِ رَٰجِعُونَ﴾ دەگەڕێنەوە بۆ لای ئەو،بە دادوەری خۆی هەچی ویستی لێبێ دەیکا. هەربۆیە کاتێ چاك زانیان کە زیندوو دەبنەوە و پاداشت وەردەگرن، ئیتر خوا پەرستی و وازهێنان لە ناڕەواکان لایان ئاسانە. وە خوای گەورە ئەفەرموێت: ﴿يَظُنُّونَ أَنَّهُم مُّلَٰقُواْ رَبِّهِمْ﴾ واتە: ئەوانە سور دەزانن دەگەنە پەروەردگاریان. ئیبنو جەریر ئەڵێت: عەرەبەکان یەقین بە گومان و گومان بە گومان ناودەبەن زۆر لە ناوەکان هەیە کە ناوی ئەو شتەیە و دژەکەشیەتی. وەك خودای گەورە ئەفەرموێت: ﴿وَرَءَا ٱلْمُجْرِمُونَ ٱلنَّارَ فَظَنُّوٓاْ أَنَّهُم مُّوَاقِعُوهَا﴾[2] تاوان باران ئاگریان بە چاوی خۆیان دی زانیان هەر تێی دەکەون. منیش دەڵێم: لە فەرمودەی سەحیحدا هاتووە: خودای گەورە لە ڕۆژی قیامەتا ئەفەرموێ بە عەبد: ئایا هاوسەرم پێنەدایت؟ ئایا ڕێزم لێنەگرتی؟ ئایا ئەسپ و وشترم بۆ ڕام نەهێنای و وازم لێنەهێنای دەسەلأت دار بی و ڕابوێری؟ ئەویش دەڵێ: بەڵێ، خودای گەورە ئەفەرموێت: ئایا دەتزانی کە تۆ پێم دەگەی؟ دەڵێ: نەخەیەر، خودای م گەورەش ئەفەرموێت: ئەمڕۆ منیش تۆ لە بیر دەکەم وەك تۆ منت لە بیر کرد[3].

﴿يَٰبَنِىٓ إِسْرَٰٓءِيلَ ٱذْكُرُواْ نِعْمَتِىَ ٱلَّتِىٓ أَنْعَمْتُ عَلَيْكُمْ وَأَنِّى فَضَّلْتُكُمْ عَلَى ٱلْعَٰلَمِينَ ﴿٤٧﴾﴾

## وە بیرهێنانەوەی نەوەی ئیسرائیل بە ڕێز لێنانیان زیاتر لە گەلانی تر

خودای گەورە ئەفەرموێت: ﴿يَٰبَنِىٓ إِسْرَٰٓءِيلَ ٱذْكُرُواْ نِعْمَتِىَ ٱلَّتِىٓ أَنْعَمْتُ عَلَيْكُمْ وَأَنِّى فَضَّلْتُكُمْ عَلَى ٱلْعَٰلَمِينَ﴾ ئەی نەوەی ئیسرائیل بیر لەو چاکە بکەنەوە کە من دەربارەتانم کردووە، لە چاو خەڵکی هەموو دنیا زیاتر ڕێزم لە ئێوە نا، خودای گەورە ئەو بەهرانەیان وە بیر دێنێتەوە کە خەڵاتی کردووە بە بابو باپیرانیان و ڕێزی لێناون بە ڕەوانەکردنی پێغەمبەران لە ناویاندا ناردنی کتێب بۆیان و ڕێزی لێناون بەسەر گەلانی

---

[1] الطبری /٢/١٦ ص٥٨.

[2] الکهف ٥٣.

[3] مسلم/٤/٢٢٧٩.

سەردەمی خۆیاندا. وەك خودای گەورە ئەفەرمویّت: ﴿وَلَقَدِ ٱخْتَرْنَٰهُمْ عَلَىٰ عِلْمٍ عَلَى ٱلْعَٰلَمِينَ﴾[1] ئەوانیشمان لەڕوی زانیاریەوە لەچاو خەلکی تردا بەڕیّزتر گرت. وە ئەفەرمویّت: ﴿وَإِذْ قَالَ مُوسَىٰ لِقَوْمِهِۦ يَٰقَوْمِ ٱذْكُرُوا۟ نِعْمَةَ ٱللَّهِ عَلَيْكُمْ إِذْ جَعَلَ فِيكُمْ أَنۢبِيَآءَ وَجَعَلَكُم مُّلُوكًا وَءَاتَىٰكُم مَّا لَمْ يُؤْتِ أَحَدًا مِّنَ ٱلْعَٰلَمِينَ﴾[2] ئەو کاتەش موسا بە هۆزەکەی خۆی وت: کەسەکانم دەبیّ هەرگیز ئەو چاکەیە لە بیر نەکەن کە خودا دەربارەی کردوون. کە ئەو هەموو پیّغەمبەرەی هەر لەناو خۆتان بۆ ڕەوانە کردووە. چەندین پادشای لە خۆتان پەیدا کردووەو ئەو شتەی بە ئیّوەی داوە، بە هیچ کەسی لەم دنیادا نەداوە، ئەبو جەعفەری ڕازی ئەلیّت: لە ڕەبیعی کوڕی ئەنەسەوە، ئەبولعالیەوە لەم دەقەدا کە خوای گەورە ئەفەرمویّت ﴿وَأَنِّى فَضَّلْتُكُمْ عَلَى ٱلْعَٰلَمِينَ﴾ وە من ڕیزم داون بەسەر هەموو خەلکی دونیا. ئەلیّت: ڕیّز دراون بەسەر خەلکی ئەو سەردەمەی خۆیاندا بە ناردنی پیّغەمبەران و کتیّب و پادشایان بۆیان، چونکە هەموو سەردەمیّ دنیایەکی خۆی هەیە[3]. هەر بەو جۆرە ڕیوایەت کراوە لە موجاهید و ڕەبیعی کوڕی ئەنەس و قەتادە و ئیسماعیلی کوڕی ئەبو خالیدەوە[4].

**ئومەتی موحەممەد (ﷺ) بەڕیّز ترە لە نەوەی ئیسرائیل**

کە دەوتریّ ئەم ئومەتە بەڕیّزترە لە نەوی ئیسرائیل بە پیّی ئەم ئایەتەیە کە خودای گەورە ڕووی وتاری دەکاتە ئەم ئومەتە و ئەفەرمویّت: ﴿كُنتُمْ خَيْرَ أُمَّةٍ أُخْرِجَتْ لِلنَّاسِ تَأْمُرُونَ بِٱلْمَعْرُوفِ وَتَنْهَوْنَ عَنِ ٱلْمُنكَرِ وَتُؤْمِنُونَ بِٱللَّهِ ۗ وَلَوْ ءَامَنَ أَهْلُ ٱلْكِتَٰبِ لَكَانَ خَيْرًا لَّهُم﴾[5] ئیّوە چاکترین کۆمەلن لەناو مەردمی دنیادا سەرتان هەلداوە، فەرمان بە چاکە ئەدەن و ڕیّ لە ناڕەوا دەبەستن، باوەڕیشتان بە خودا هەیە، خۆ ئەگەر ئەهلی کتیّبیش بڕوایان بهیّنایە، بۆیان چاکتر بوو. ئەوانیش هی وایان تیّدایە خاوەنباوەڕن، بەشی زۆریشیان لە ڕیّی خودا لایان داوە. وە لە موسەنەد و سەنەدەکانیشا هاتووە لە موعاویەی کوڕی حەیدەی قوشیریەوە ئەلیّت: پیّغەمبەری خودا(ﷺ) فەرمویەتی: ئیّوە جیّگرەوەی

---

[1] الدخان ٣٢.

[2] المائدة ٢٠.

[3] ابن ابی حاتم/٢/٢٤ ص٥٨.

[4] ابن ابی حاتم /١/١٥٨.

[5] ال عمران ١١٠.

(توفون) حەفتا ئومەتن، ئێوە چاکترین و بەڕێزترینیانن لەلای خودا[1]. فەرموده لەم بارەیەوە زۆرە لە لامی ئایەتی: ﴿ كُنتُمْ خَيْرَ أُمَّةٍ أُخْرِجَتْ لِلنَّاسِ ﴾دا باسدەکرێ.

﴿ وَاتَّقُوا يَوْمًا لَا تَجْزِي نَفْسٌ عَن نَّفْسٍ شَيْئًا وَلَا يُقْبَلُ مِنْهَا شَفَاعَةٌ وَلَا يُؤْخَذُ مِنْهَا عَدْلٌ وَلَا هُمْ يُنصَرُونَ ﴿٤٨﴾ ﴾

خودای گەورە ئەفەرموێت: ﴿ وَاتَّقُوا يَوْمًا لَا تَجْزِي نَفْسٌ عَن نَّفْسٍ شَيْئًا ﴾ خۆتان بپارێزن لەوڕۆژەی کەس تاوانی ناچێتە سەر کەسی تر. ئەوەبو لەسەرەتادا خودای گەورە باسی بەهرەکانی خۆی بۆ کردن، پاشان دەیان ترسێنێ لەو کارەسات و بەڵا بەردەوامانەی ڕۆژی قیامەت وئەفەرموێت: ﴿ وَاتَّقُوا يَوْمًا ﴾ خۆتان بپارێزن لە ڕۆژێ، واتە: ڕۆژی قیامەت: ﴿ لَا تَجْزِي نَفْسٌ عَن نَّفْسٍ شَيْئًا ﴾ کەس تاوانی کەسی تر هەڵناگرێ. وەك خودای گەورە لە ئایەتی تریشدا ئەفەرموێت: ﴿ وَلَا تَزِرُ وَازِرَةٌ وِزْرَ أُخْرَىٰ[2] ﴾ هیچ کەس باری گرانی هیچ کەس ناگرێتە کۆڵ. وە ئەفەرموێت: ﴿ لِكُلِّ امْرِئٍ مِّنْهُمْ يَوْمَئِذٍ شَأْنٌ يُغْنِيهِ ﴾[3] لەو ڕۆژەدا هەرکەسێ کاری خۆی هەیە و نایەرژێتە سەر کەسی تر. وە ئەفەرموێت: ﴿ يَا أَيُّهَا النَّاسُ اتَّقُوا رَبَّكُمْ وَاخْشَوْا يَوْمًا لَّا يَجْزِي وَالِدٌ عَن وَلَدِهِ وَلَا مَوْلُودٌ هُوَ جَازٍ عَن وَالِدِهِ شَيْئًا ﴾[4] ئەی خەڵکینە! دەبێ لە پەروەردگارتان ترستان هەبێ، ترسی ئەو ڕۆژەتان هەبێ کە هیچ باوکێك ئۆباڵی فەرزندەی خۆی لەسەر نیە، هیچ فەرزندەیەکیش بۆ باوکی سودی نابێ. ئەمە ئیتر ئەوپەڕی تەنگانەیە کە باوك و کوڕ نەیان پەرژێتە سەر یەکتری.

## هیچ تکا و بارمتەیەك لە خوانەناس وەرناگیرێ و یارمەتیش نادرێن

خودای گەورە ئەفەرموێت: ﴿ وَلَا يُقْبَلُ مِنْهَا شَفَاعَةٌ ﴾ تکای کەس بۆ کەس وەرناگیرێ؛ واتە: لە خوانەناسان. وەك ئەفەرموێت: ﴿ فَمَا تَنفَعُهُمْ شَفَاعَةُ الشَّافِعِينَ ﴾[5] ئیتر تکای تکاکاران هیچ بەهرەیەکیان بۆ نادا. وەك خودای گەورە دەربارەی خەڵکی ناو ئاگر ئەفەرموێت: ﴿ فَمَا لَنَا مِن شَافِعِينَ ﴿١٠٠﴾ وَلَا صَدِيقٍ حَمِيمٍ ﴾[6] ئێستاش نە تکا کارمان هەیە و نە هاوەڵێکی دڵسۆزیش. وە لێرەدا ئەفەرموێت: ﴿ وَلَا يُؤْخَذُ مِنْهَا عَدْلٌ ﴾

---

[1] أحمد /٤/٤٤٧/٥/٣/، تحفة الاحوذی /٨/٣٥٢/، ابن ماجة/١٤٣٣/٢/، فه رموده يه كی سه حيحه.

[2] الانعام ١٦٤.

[3] عبس ٣٧.

[4] لقمان ٣٣.

[5] المدثر ٤٨.

[6] الشعراء ١٠٠-١٠١.

نە بارمتەی تێدا هەیە. واتە: قوربانیشی تێدا وەرناگیرێ. وەك خودای گەورە ئەفەرموێت: ﴿إِنَّ ٱلَّذِينَ كَفَرُواْ وَمَاتُواْ وَهُمْ كُفَّارٌ فَلَن يُقْبَلَ مِنْ أَحَدِهِم مِّلْءُ ٱلْأَرْضِ ذَهَبًا وَلَوِ ٱفْتَدَىٰ بِهِۦٓ﴾[1] ئەوانەی خوانەناس بوون و هەر بە خوانەناسی مردوون، هەرکامێکیان ئەگەر پڕی ئەم زەمینە ئاڵتونیش بە بارمتە بدا، هەرگیز سودی پێناگەیەنێ. وە ئەفەرموێت: ﴿إِنَّ ٱلَّذِينَ كَفَرُواْ لَوْ أَنَّ لَهُم مَّا فِى ٱلْأَرْضِ جَمِيعًا وَمِثْلَهُۥ مَعَهُۥ لِيَفْتَدُواْ بِهِۦ مِنْ عَذَابِ يَوْمِ ٱلْقِيَٰمَةِ مَا تُقُبِّلَ مِنْهُمْ ۖ وَلَهُمْ عَذَابٌ أَلِيمٌ﴾[2] ئەو کەسانەی خوانەناس بوون، ئەگەر هەرچی لە زەمیندا هەیە و ماڵە و ئەوەندەی تریشی لەگەڵ خەن و بە هیواشی بن لە سزای ڕۆژی قیامەت ڕزگاریان کا و خۆیانی پێ بکڕنەوە جێگە ناگرێ و بە هیچ ناچێ و ئازاری زۆر بە ژانیان هەر تووش دەبێ. وە ئەفەرموێت: ﴿وَإِن تَعْدِلْ كُلَّ عَدْلٍ لَّا يُؤْخَذْ مِنْهَآ﴾[3] هەرچی ماڵ و دنیاش هەبێ و لەلای ئەو بێ لە قەرەبوی خۆیدا بیدا قبوڵ ناکرێ. وە ئەفەرموێت: ﴿فَٱلْيَوْمَ لَا يُؤْخَذُ مِنكُمْ فِدْيَةٌ وَلَا مِنَ ٱلَّذِينَ كَفَرُواْ ۚ مَأْوَىٰكُمُ ٱلنَّارُ ۖ هِىَ مَوْلَىٰكُمْ﴾[4] ئیتر ئەمڕۆ نە لەوانەی ئێوە نە لەوانەی خوانەناس بوون سەرافەتان لێوەرناگیرێ، جێتان هەر ئاگرە و هەر ئەوێشتان پێ ڕەوایە. خودای گەورە ئەفەرموێت ئەگەر بڕوا نەهێنن بە پێغەمبەرەکەی و شوێنی نەکەون لەو پەیامەدا پێی هاتووە، کاتێ کە دەچنەوە بۆ لای خودا لە ڕۆژی قیامەتدا بەو ماڵەوە بێگومان نزیکی و تکای هیچ کەسێ سودیان پێناگەیەنێ هیچ بارمتەیەکیشیان لێوەرناگیرێ با بەئەندازەی پڕی هەموو زەمین ئاڵتونیشی بێ. وەك خودای گەورە ئەفەرموێت: ﴿مِّن قَبْلِ أَن يَأْتِىَ يَوْمٌ لَّا بَيْعٌ فِيهِ وَلَا خُلَّةٌ وَلَا شَفَٰعَةٌ﴾[5] پێش ئەوە ئەو ڕۆژە بێت، کە ئەو ڕۆژە نەکڕین و فرۆشتن دەمێنێ و نە تکا و نە دۆستایەتی. وە ئەفەرموێت: ﴿لَّا بَيْعٌ فِيهِ وَلَا خِلَٰلٌ﴾[6] نەکڕین و فرۆشتن هەیە و نە دۆستایەتی و هاوەڵی. وە لێرەیشدا ئەفەرموێت: ﴿وَلَا هُمْ يُنصَرُونَ﴾ وە ئەمانە یارمەتیش نادرێن. واتە: هیچ کەسێ نیگەرانێ نابێ بۆیان ڕزگاریان بکا لە سزای خودا، وەك لە پێشەوە باسکرا هیچ کەسێ بەزەیی نایاتەوە پیایاندا لە خزم و کەس و کار و بارمتەشیان لێوەر

---

[1] ال عمران ٩١.

[2] المائدة ٣٦.

[3] الانعام ٧٠.

[4] الحديد ١٥.

[5] البقرة ٢٥٤.

[6] إبراهيم ٣١.

ناگیرێ. وەك بەزەیی پیا هاتنەوەو کەسیش نایە بە هاواریانەوە و خۆشیان هیچ دەسەلاّتێکیان نیە.

وەك خودای گەورە ئەفەرموێت: ﴿فَمَا لَهُۥ مِن قُوَّةٍ وَلَا نَاصِرٍ﴾[1] ئەو نە هیچ هێزێکی هەیە و نە یارمەتی دەر. واتە: خودای گەورە هیچ بارمتەو تکایە وەرناگرێ لە وانەی کە بڕوایان پێی نیە و کەس ناتوانێ لەئەو ڕزگاریان بکا و هیچ کەسێ لەدەستی دەرناچێ و کەسیش بۆی نیە پەنای بدات. وە ئەفەرموێت: ﴿وَهُوَ يُجِيرُ وَلَا يُجَارُ عَلَيْهِ﴾[2] پەنای پەنا بەرەو دژی ئەو پەنا نادرێ. وە ئەفەرموێت: ﴿فَيَوْمَئِذٍ لَّا يُعَذِّبُ عَذَابَهُۥٓ أَحَدٌ ﴿٢٥﴾ وَلَا يُوثِقُ وَثَاقَهُۥٓ أَحَدٌ﴾[3] ئەو ڕۆژە کەس وەك ئەو سزانادەن، کەسیش وەك ئەو بە زنجیر شەتەك نادرێ. وە ئەفەرموێت: ﴿مَا لَكُمْ لَا تَنَاصَرُونَ ﴿٢٥﴾ بَلْ هُمُ ٱلْيَوْمَ مُسْتَسْلِمُونَ﴾[4] چیتانە بۆچی بەهانای یەکترەوە نایەن؟ ئەمڕۆ هەموو بێدەنگ و ملکەچ وەستاون. وە ئەفەرموێت: ﴿فَلَوْلَا نَصَرَهُمُ ٱلَّذِينَ ٱتَّخَذُوا۟ مِن دُونِ ٱللَّهِ قُرْبَانًا ءَالِهَةًۢ ۖ بَلْ ضَلُّوا۟ عَنْهُمْ﴾[5] ئایا بۆچی ئەو شتانەی جگە لە خودا دەیان پەرست تا بەو هۆیەوە لە خۆیان نزیك کەنەوە هیچ بە هانایانەوە نەهاتن؟ بەڵکو گوم بوون لێیان. زەححاك لە ئیبنو عەباسەوە ئەڵێت: لەم ئایەتەدا: ﴿مَا لَكُمْ لَا تَنَاصَرُونَ﴾ چیتانە بۆچی بەهانای یەکتریەوە نایەن؟ واتە: چیتانە بۆچی نایەن ئەمڕۆ پارێزگاریان لێبکەن لە ئێمە، ئەو ڕۆژە ڕۆژی ئێوە نیە و هەرگیز ناتوانن یارمەتیان بدەن[6]. ئیبنو جەریر ئەڵێت: ﴿وَلَا هُمْ يُنصَرُونَ﴾ ئەوانە یارمەتی نادرێن، ئەڵێت: نە بارمتە و نە قوربانیان لێوەرناگیرێ و لەو ڕۆژەدا هیچ کەسێ یارمەتیان نادا و تکایان بۆ ناکا، خۆشەویستی نێوان هەموو بەتاڵ دەبێتەوە وبەرتیل و تکا کردن نامێنێ، خۆ بەزل زانی و هاوکاری یەکتری هیچ دەوری نامێنێ. دەسەلاّت هەر دەسەلاّتی خودای جەبار و دادوەرە کە هیچ تکاکارو یارمەتی دەرێ سودی نیە، هەرکەس بە پێی خراپەی خۆی تۆڵەی خۆی وەردەگرێ و چاکەیش بە چەند بارە وەك خودای گەورە لەم ئایاتانەشدا ئەفەرموێت: ﴿وَقِفُوهُمْ ۖ إِنَّهُم مَّسْـُٔولُونَ ﴿٢٤﴾ مَا لَكُمْ لَا تَنَاصَرُونَ

---

[1] الطارق ١٠.

[2] المؤمنون ٨٨.

[3] الفجر ٢٥-٢٦.

[4] الصافات ٢٥-٢٦.

[5] الاحقاف ٢٨.

[6] الطبری /٢/٣٦ ص٥٩.

﴿بَلْ هُمُ ٱلْيَوْمَ مُسْتَسْلِمُونَ﴾[١] ﴿٢٥﴾ ڕایان بگرن دەبێ پرسیاریان لێبکرێ، چیتانە بۆ بە هانای یەکترەوە نایەن، ئەمڕۆ هەموو بێدەنگ و ملکەچ وەستاون.

﴿وَإِذْ نَجَّيْنَٰكُم مِّنْ ءَالِ فِرْعَوْنَ يَسُومُونَكُمْ سُوٓءَ ٱلْعَذَابِ يُذَبِّحُونَ أَبْنَآءَكُمْ وَيَسْتَحْيُونَ نِسَآءَكُمْ ۚ وَفِى ذَٰلِكُم بَلَآءٌ مِّن رَّبِّكُمْ عَظِيمٌ ﴿٤٩﴾ وَإِذْ فَرَقْنَا بِكُمُ ٱلْبَحْرَ فَأَنجَيْنَٰكُمْ وَأَغْرَقْنَآ ءَالَ فِرْعَوْنَ وَأَنتُمْ تَنظُرُونَ ﴿٥٠﴾﴾

**ئاگامی نەوەی ئیسرائیل لە فیرعەون و نغرۆ بوونی هۆزی فیرعەون**

خودای گەورە باسی بەهرەکانی خۆی دەکا لەسەر نەوەی ئیسرائیل و ئەفەرموێت: ﴿وَإِذْ نَجَّيْنَٰكُم مِّنْ ءَالِ فِرْعَوْنَ يَسُومُونَكُمْ سُوٓءَ ٱلْعَذَابِ﴾ بیر بکەنەوەکاتێك کە ڕزگارم کردن لە فیرعەون و دارو دەستەکەی،کە سزای سەختیان ئەدان. ڕزگارمان کردن لە دەستیان کاتێ کە لەگەڵ موسا ڕۆشتن. واتە: فیرعەون و دارو دەستەکەی بەردەوام ئازاری نەوی ئیسرائیلیان ئەدا، چونکە فیرعەون نەفرینی خوای لێبێ خەوێکی بینیبوو زۆر ترساندبووی. لە خەویدا ئاگرێکی دی لە قودسی پیرۆزەوە دەرچوو، ڕۆشتە ناو هەموو ماڵە قیبتیەکان لە وڵاتی میسرا. نەچووە ماڵەکانی نەوەی ئیسرائیل. مانای خەوەکە ئەمە بوو کە دەسەڵاتەکەی لەناو دەچێ بەدەستی پیاوێك لە نەوەی ئیسرائیل. وتراوە: ئەوانەی کە بەشەو لەلای دەبوون پێیان دەوت: نەوەی ئیسرائیل بە هیوای هاتنی پیاوێکن لە خۆیان کە دەبێتە گەورەو خاوەندەسەڵات، لەو کاتەوە فیرعەون نەفرینی خوای لێبێ فەرمانی کوشتنی ئەو کوڕانەی دا کە لەدایك دەبن لە نەوەی ئیسرائیل و کچەکانی هێشتنەوە. بڕیاریشی دا کە هەموو نەوەی ئیسرائیل بە کار بێنن لە کارە زۆر گران و خراپەکاندا. لێرەدا تەفسیری ئەو جەزرەبەدانە بە سەربڕینی مناڵەکان کراوە. وە لە سوورەتی ئیبراهیمیشدا ئاماژەی پێکراوە. وەك خودای گەورە ئەفەرموێت: ﴿يَسُومُونَكُمْ سُوٓءَ ٱلْعَذَابِ وَيُذَبِّحُونَ أَبْنَآءَكُمْ وَيَسْتَحْيُونَ نِسَآءَكُمْ﴾[٢] زۆرخراپ ئازاریان ئەدان کوڕەکانیان لێسەر دەبڕین، ژنەکانیان بە زیندویی دەهێشتەوە. وە لە سورەتی قەسەسدا بەو زوانە باسی دێت بە ویستی خوای گەورە. هەربۆیە لێرەدا ئەفەرموێت: ﴿يُذَبِّحُونَ أَبْنَآءَكُمْ وَيَسْتَحْيُونَ نِسَآءَكُمْ﴾ کوڕەکانی سەردەبڕین و ژنەکانی بە زیندویی دەهێشتەوە. بۆ ئەوە ئەم دەقە ببێتە تەفیسر بۆ ئەو بەهرانەی کە خودای گەورە پێی بەخشیون کە ئەفەرموێت: ﴿يَسُومُونَكُمْ﴾زۆر خراپ سزایان

---

[١] الصافات ٢٤-٢٦.

[٢] إبراهيم ٦.

ئەدان،پاشان تەفسیری ئەمە دەکا لوێدا و ئەفەرموێت: ﴿ٱذۡكُرُواْ نِعۡمَتِيَ ٱلَّتِيٓ أَنۡعَمۡتُ عَلَيۡكُمۡ﴾[1] لەبیرتانبێ چەندم چاکەلەگەڵ کردون. بەڵام کاتێ لە سوورەتی ئیبراهیمدا ئەفەرموێت: ﴿وَذَكِّرۡهُم بِأَيَّىٰمِ ٱللَّهِ﴾[2] ڕۆژەکانی خودایان وە بیر بهێنەوە. جێی خۆیەتی کە لێرەدا ئەفەرموێت: ﴿يَسُومُونَكُمۡ سُوٓءَ ٱلۡعَذَابِ يُذَبِّحُونَ أَبۡنَآءَكُمۡ وَيَسۡتَحۡيُونَ نِسَآءَكُمۡ﴾ زۆر خراپ ئازاریان ئەدان، کوڕەکانیان سەردەبڕی و ژنەکانیان بە زیندویی دەهێشتنەوە. باسی سەربڕینی بە دوایدا هێناوە بۆ ئەوەی ئەو هەموو بەهرەیە بکاتە بەڵگە لەسەر نەوەی ئیسرائیل. فیرعەون ناوێك بووە بۆکەسێ کە دەسەڵاتی بووە بەسەر میسرا خوانەناس بووە لە عەمالیقەکان و غەیرەز عەمالیقەکانیش. وەك چۆن قەیسەر ناوێك بووە بۆ هەرکەسێ دەسەڵای هەبووە بەسەر ڕۆم و شامدا و خوانەناسیش بووە. وە کیسرا ناوێك بووە بۆ هەرکەسێ دەسەڵاتی هەبووە بەسەر فارسەکاندا، توبەع یش ناوێك بووە بۆ کەسێ دەسەڵاتی هەبووە بەسەر یەمەندا و خوانەناسیش بووە،نەجاشی بۆ کەسێ بەکار هێنراوە کە دەسەڵاتی هەبووە بەسەر حەبەشەدا. پاشان خوای گەورە ئەفەرموێت: ﴿وَفِي ذَٰلِكُم بَلَآءٞ مِّن رَّبِّكُمۡ عَظِيمٞ﴾ گەلێك تاقی کردنەوەی گەورە هەبوو لە پەروەردگارتانەوە. ئیبنو جەریر ئەڵێت: لەوەی کە بەسەرمان هێنان لە ڕزگارکردنتان لەو سزایە کە توشتان هابوو بەدەستی فیرعەون و دارو دەستەکەیەوە، بە خۆتان و باب و باپیرانتانەوە، ئەوە بەڵایەکی زۆر گەورە بوو لەلایەن پەروەردگارتانەوە کە توشتان هاتبوو. واتە: بەهرەیەکی زۆر گەورە بوو بەسەرتانەوە لەوەدا[3]. ئەسڵی بەلا تاقی کردنەوەیە، بۆ چاکەو خراپەیش بەکار دەهێنرێ. وەك خودای گەورە ئەفەرموێت: ﴿وَنَبۡلُوكُم بِٱلشَّرِّ وَٱلۡخَيۡرِ فِتۡنَةٗ﴾[4] وە ئێمەبەخراپە و بەچاکە بێ تاقیان دەکەینەوە تاچاك و خراپ دەرکوێ. وە ئەفەرموێت: ﴿وَبَلَوۡنَٰهُم بِٱلۡحَسَنَٰتِ وَٱلسَّيِّـَٔاتِ لَعَلَّهُمۡ يَرۡجِعُونَ﴾[5] بە خۆشیان و بە ناخۆشیانیشمان تاقی کردنەوە، سا بەڵکو بگەڕێنەوە. ئیبنو جەریر ئەڵێت: زۆرجار لە بارەی شەڕەوە دەوترێ: (بلوته أبلو بلا) وە لەبارەی خەیرەوە دەوترێ: (أبليه إبلا و بلا)[6]. پاشان خودای گەورە ئەفەرموێت: ﴿وَإِذۡ فَرَقۡنَا بِكُمُ ٱلۡبَحۡرَ فَأَنجَيۡنَٰكُمۡ

[1] البقرة ٤٠.
[2] إبراهيم ٥.
[3] الطبری /٢/٤٨.
[4] الانبياء ٣٥.
[5] الاعراف ١٦٨.
[6] الطبری /٢/٤٩.

وَأَغْرَقْنَآ ءَالَ فِرْعَوْنَ وَأَنتُمْ تَنظُرُونَ﴾ ئەو کاتەیش کە ئێمە دەریامان بۆ لەت کردن و ڕزگارمان کردن و ئەوانەی لەگەڵ فیرعەون بوون هەموومان بە خنکاندن داو ئێوە تەماشاتان دەکردن. یانی: دوای ئەوەی ڕزگارمان کردن لە فیرعەون و دارو دەستەکەی و لەگەڵ موسا سەلامی خوا لێبێ دەرچوون، فیرعەون هات بە دواتاندا، دەریامان بۆلەت کردن، وەك خودای گەورە بەدرێژی باسی کردووە لەشوێنی خۆیدا بەو زوانە باسی دێت. لە سوورەتی شوعەرادا بە ویستی خودا. ﴿فَأَنجَيْنَٰكُمْ﴾ ڕزگارمان کردن لە فیرعەون و دارو دەستەکەی و ئێوەمان لەوان جیا کردەوەو خنکاندمانن ئێوە سەیرتان دەکردن، بۆ ئەوەی بحەسێنەوەو دڵتان پێی ئارام ببێتەوەو دوژمنەکەشتان سەر شۆڕو زەلیل بێ.

## ڕۆژوی ڕۆژی عاشوورا

چەندین فەرموده دەربارەی ڕۆژی عاشورا هاتووە، وەك ئیمامی ئەحمەد ریوایەتی کردووە لە ئیبنو عەباسەوە ئەڵێت: کاتێ پێغەمبەری خودا (ﷺ) گەیشتە مەدینە بینی جوولەکە بەڕۆژون لە ڕۆژی عاشورادا فەرمووی: ئەو ڕۆژە چیە وا تێدا بە ڕۆژو دەبن؟ وتیان: ئەمە ڕۆژێکی چاکە، ئەو ڕۆژەیە خودای گەورە ئەوەی ئیسرائیلی تێدا ڕزگار کرد لە دوژمنەکەیان، موسا سەلامی خوای لێبێ بەڕۆژو بوو تێیدا. پێغەمبەری خودا(ﷺ)فەرموی: ئێمە لە پێشترین بۆ موسا لە ئێوە، پێغەمبەری خودا بەڕۆژو بوو تێیدا و فەرمانی دا بە ڕۆژو گرتنی ئەو ڕۆژە[1]. ئەم فەرموده بوخاری و موسلیم و نەسائی و ئیبنو ماجەیش ڕیوایەتیان کردووە[2].

﴿وَإِذْ وَٰعَدْنَا مُوسَىٰٓ أَرْبَعِينَ لَيْلَةً ثُمَّ ٱتَّخَذْتُمُ ٱلْعِجْلَ مِنۢ بَعْدِهِۦ وَأَنتُمْ ظَٰلِمُونَ ﴿٥١﴾ ثُمَّ عَفَوْنَا عَنكُم مِّنۢ بَعْدِ ذَٰلِكَ لَعَلَّكُمْ تَشْكُرُونَ ﴿٥٢﴾ وَإِذْ ءَاتَيْنَا مُوسَى ٱلْكِتَٰبَ وَٱلْفُرْقَانَ لَعَلَّكُمْ تَهْتَدُونَ ﴿٥٣﴾﴾

## نەوەی ئیسرائیل گوێرەکەیان پەرست

خودای گەورە ئەفەرموێت: ﴿وَإِذْ وَٰعَدْنَا مُوسَىٰٓ أَرْبَعِينَ لَيْلَةً ثُمَّ ٱتَّخَذْتُمُ ٱلْعِجْلَ مِنۢ بَعْدِهِۦ﴾ کاتێ کە بەڵێنی چل شەوماندا بە موسا، ئێوە ئەو ناهەقیەتان کرد،پاش ئەوە گوێرەکەتان پەرست. خودای گەورە ئەفەرموێت: ئەو بەهرانەی من وەبیر خۆتان بێننەوە کە لێتان خۆش بووم کاتێ کە گوێرەکەکەتان پەرست دوای ڕۆشتنی موسا سەلامی خوای لێبێ بۆ ئەو شوێنەی خودا بۆی دیاری کردبوولە کاتی تەواو بوونی بەڵێنەکە کە چل ڕۆژ بوو. کە لە سوورەتی ئەعرافدا باس کراوە کە

---

[1] احمد /١/٢٩١/سه حيحه.

[2] فتح الباری /٤/٢٨٧/، مسلم/٢/٧٩٦/،النسائی/٢/١٥٧.

ئەفەرمویت: ﴿وَوَٰعَدۡنَا مُوسَىٰ ثَلَٰثِينَ لَيۡلَةٗ وَأَتۡمَمۡنَٰهَا بِعَشۡرٖ﴾[1] وە بەلێنمان بە موسا دا سی شەو وە دە شەوی ترمان بۆ خستە سەر. وتراوە مانگی زیلقەعدە بەتەواوی و دە ڕۆژی زیلحجە بوە، دوای ڕزگاربونیان لەدەستی فیرعەون و دەرچونیان بووە لە دەریاکە. پاشان خودای گەورەئەفەرمویت: ﴿ثُمَّ عَفَوۡنَا عَنكُم مِّنۢ بَعۡدِ ذَٰلِكَ لَعَلَّكُمۡ تَشۡكُرُونَ﴾ لەپاش ئەمەش لێتان خۆش بوین،بەڵکو شوکرانە بژێر بن، پاشان خودای گەورە ئەفەرمویت: ﴿وَإِذۡ ءَاتَيۡنَا مُوسَى ٱلۡكِتَٰبَ﴾ ئەوساش کە ئێمە کتێب واتە: تەورات و ﴿وَٱلۡفُرۡقَانَ﴾ هۆی جیا کردنوەمان دا بە موسا، ﴿لَعَلَّكُمۡ تَهۡتَدُونَ﴾ بەڵکوئێوە شارەزابن. ئەمەیش هەر دوای دەرچونیان بووە لە دەریاکە. وەك چۆن لە سوورەتی ئەعرافدائاماژەی پێکراوە و لەم ئایەتەیشدا ئەفەرمویت: ﴿وَلَقَدۡ ءَاتَيۡنَا مُوسَى ٱلۡكِتَٰبَ مِنۢ بَعۡدِ مَآ أَهۡلَكۡنَا ٱلۡقُرُونَ ٱلۡأُولَىٰ بَصَآئِرَ لِلنَّاسِ وَهُدٗى وَرَحۡمَةٗ لَّعَلَّهُمۡ يَتَذَكَّرُونَ﴾[2] لە پاش ئەوەی چین و بەرەکانی ترمان قڕ تێخستن، ئەو کتێبەمان دا بە موسا کە بۆ مەردوم ببێتە هۆی ڕۆشن بینی و بەزەیی و شارەزای ڕێگە بوون، بەڵکو بیر لە خۆیان بکەنەوە.

﴿وَإِذۡ قَالَ مُوسَىٰ لِقَوۡمِهِۦ يَٰقَوۡمِ إِنَّكُمۡ ظَلَمۡتُمۡ أَنفُسَكُم بِٱتِّخَاذِكُمُ ٱلۡعِجۡلَ فَتُوبُوٓاْ إِلَىٰ بَارِئِكُمۡ فَٱقۡتُلُوٓاْ أَنفُسَكُمۡ ذَٰلِكُمۡ خَيۡرٞ لَّكُمۡ عِندَ بَارِئِكُمۡ فَتَابَ عَلَيۡكُمۡۚ إِنَّهُۥ هُوَ ٱلتَّوَّابُ ٱلرَّحِيمُ ﴿٥٤﴾﴾

### تەوبەی نەوەی ئیسرائیل بە کوشتنی خۆیان بووە

خودای گەورە ئەفەرمویت: ﴿وَإِذۡ قَالَ مُوسَىٰ لِقَوۡمِهِۦ يَٰقَوۡمِ إِنَّكُمۡ ظَلَمۡتُمۡ أَنفُسَكُم بِٱتِّخَاذِكُمُ ٱلۡعِجۡلَ﴾ ئەوسا موسا بە هۆزەکەی خۆی ڕاگەیاند، گەلەکەم بە گوێرەکە پەرستیتان ناهەقیتان لە خۆتان کرد. ئەمە شێوەی وەرگرتنی تەوبەی نەوەی ئیسرائیل بوو لەلایەن خوداوە کە گوێرەکەکەیان پەرست. حەسەنی بەسری لەم ئایەتەدا ﴿وَإِذۡ قَالَ مُوسَىٰ لِقَوۡمِهِۦ يَٰقَوۡمِ إِنَّكُمۡ ظَلَمۡتُمۡ أَنفُسَكُم بِٱتِّخَاذِكُمُ ٱلۡعِجۡلَ﴾ کاتێ موسا بە هۆزەکەی خۆی ڕاگەیاند: گەلەکەم بە گوێرەکە پەرستیتان ناهەقیتان لە خۆتان کرد: وتی: ئەوە لە کاتێکا بوو کە پەرستنی گوێرەکەکە ڕوی دابوو. خودای گەورە ئەفەرمویت: ﴿وَلَمَّا سُقِطَ فِيٓ أَيۡدِيهِمۡ وَرَأَوۡاْ أَنَّهُمۡ قَدۡ ضَلُّواْ قَالُواْ لَئِن لَّمۡ يَرۡحَمۡنَا رَبُّنَا وَيَغۡفِرۡ لَنَا﴾[3] کاتێ تەواو پەشیمانی دای گرتن و دیان سەریان لێشێواوە، وتیان: ئەگەر پەروەردگارمان بەر بەزەیی خۆیمان نەخات و لە

---

[1] الاعراف ١٤٢.

[2] القصص ٤٣.

[3] الاعراف ١٤٩.

گوناهمان نەبورێ، ئێمە لەزیان بارانین. وتی: ئەمە لەکاتێکابووە کە موسا پێیان دەڵێ: ﴿إِنَّكُمْ ظَلَمْتُمْ أَنفُسَكُم بِاتِّخَاذِكُمُ الْعِجْلَ لَعَلَّكُمْ﴾[1]. کەلەکەم بە گوێرەکە پەرستیتان ناهەقیتان لە خۆتان کرد. ئەبولعالیە و سەعیدی کوڕی جوبەیر و ڕەبیعی کوڕی ئەنەس ئەڵێن: ﴿فَتُوبُوا إِلَى بَارِئِكُمْ﴾ پەشیمانی لەلای وەدی هێنەرتان دەربڕن. واتە: لای ئەو کەسەی کە دروستی کردوون[2]. منیش لێرە دەڵێم: ﴿إِلَى بَارِئِكُمْ﴾ ئاگاداریەکە لەسەر ئەو تاوانەی کە کردویانە. واتە: پەشیمانی لەلای ئەو کەسە دەربڕن دروستی کردوون کە ئێوە لەگەڵیدا گوێرەکەتان پەرستووە. نەسائی و ئیبنو جەریر و ئیبنو ئەبی حاتەم ڕیوایەتیان کردووە لە ئیبنو عەباسەوە ئەڵێت: خودای گەورە ئەفەرموێ: تەوبەکەیان ئەوەیە هەر یەکێ لەوانەهەرکەسێ کەوتە بەردەستی باوکی بێ یا کوڕی بێ بە شمشێر لێی بدا و بیکوژێ. دەبێ گوێ نەدا بەوە کە کوشتویەتی لەوێدا، ئەوانەی کە لای موسا و هاروون دیار نەبوون، خودا خۆی دەیناسین و دانیان بە تاوانە کانیاندا تا ئەوەی فەرمانیان پێکرا پێی هەڵسان، خودای مەزن خۆش بوو لە بکوژو کوژراویش[3]. ئیبنو جەریر ڕیوایەتی کردووە لە ئیبنو عەباسەوە ئەڵێت: موسا وتی بە هۆزەکەی: ﴿فَتُوبُوا إِلَى بَارِئِكُمْ فَاقْتُلُوا أَنفُسَكُمْ ذَلِكُمْ خَيْرٌ لَّكُمْ عِندَ بَارِئِكُمْ فَتَابَ عَلَيْكُمْ إِنَّهُ هُوَ التَّوَّابُ الرَّحِيمُ﴾ پەشیمانی لەلای بەدی هێنەرتانەوە دەربڕن، سا وەرن یەکتر بکوژن، لای بەدی هێنەرتانەوە ئەم کارە بۆتان چاکترە. کە تۆبەی لێقبوڵ کردن، هەر ئەویشە لە پەشیمانان خۆش دەبێ و دلۆڤانە. وتی: موسا لەسەر بڕیاری خودای گەورە فەرمانی دا بە هۆزەکەی کە خۆیان بکوژن، ئەوانەی کە گوێرەکەکەیان پەرستبوو ئاگادار کرد کە دانیشن، ئەوانەیش کە گوێرەکەکەیان نەپەرستبوو هەڵسان و خەنجەریان بەدەستەوە بوو. توشی تاریکاییەکی یەکجار زۆر هاتن و دەستیان کرد بە کوشتنی یەکتر. پاشان کەتاریکایەکە ڕەویەوە و ئەما حەفتا هەزار کەس کوژرابوو، ئەوانەیان کە کوژرابوون ئەوە تەوبەکەی بوو، ئەوانەش کە مابوونەوە هەر ئەوە تەوبەکەیان بوو[4]. واتە: خودا لە هەردوو لایان خۆش بوو ئەوانەی کوژران و ئەوانەی کە مانەوە.

﴿وَإِذْ قُلْتُمْ يَا مُوسَى لَن نُّؤْمِنَ لَكَ حَتَّى نَرَى اللَّهَ جَهْرَةً فَأَخَذَتْكُمُ الصَّاعِقَةُ وَأَنتُمْ تَنظُرُونَ ﴿٥٥﴾ ثُمَّ بَعَثْنَاكُم مِّن بَعْدِ مَوْتِكُمْ لَعَلَّكُمْ تَشْكُرُونَ ﴿٥٦﴾﴾

---

[1] ابن ابی ماجة /١/١٦٧ ص٦١.

[2] ابن ابی حاتم/١/١٦٧.

[3] النسائی فی الکبراء/٦/٤٠٤/٤٠٥/، الطبری/٨/٣٠٦/، ابن ابی حاتم/١/١٦٨.

[4] الطبری /٢/٧٣.

**ئەوانەی هەڵبژێرابوون داوای بینینی خودایان کرد خودای مەزن مراندنی و پاشان زیندوی کردنەوە**

خودای مەزن ئەفەرموێت: ﴿وَإِذْ قُلْتُمْ يَـٰمُوسَىٰ لَن نُّؤْمِنَ لَكَ حَتَّىٰ نَرَى ٱللَّهَ جَهْرَةً فَأَخَذَتْكُمُ ٱلصَّـٰعِقَةُ وَأَنتُمْ تَنظُرُونَ﴾ ئەوساش بە موساتان وت: ئێمە بڕوات پێناهێنین تا بە ئاشکرا خوا نەبینین. هەر لەبەر چاوی خۆتان بروسکەتان بەسەردا هات. خودای گەورە ئەفەرموێت: ئەو بەهرانەی من وەبیر خۆتان بێننەوە کە پێم بەخشین دوای بروسکەکە کاتێ کە داوای بینینی منتان کردبە ئاشکرا کە لە توانای ئێوە و هاو شێوەی ئێوەدا نیە، چاوی بە من بکەوێ. وەك ئیبنو جورەیج ئەڵێت: ئیبنو عەباس لەم ئایەتەدا ئەڵێت: ﴿وَإِذْ قُلْتُمْ يَـٰمُوسَىٰ لَن نُّؤْمِنَ لَكَ حَتَّىٰ نَرَى ٱللَّهَ جَهْرَةً﴾ کاتێ بە موساتان وت: ئێمە بڕوات پێناهێنین تا بە ئاشکرا خودا نەبینین. وتی: بە ئاشکرا[1]. واتە: تاخودا نەبینین[2]. عوروەی کوڕی ڕوەیم وتی: ﴿وَأَنتُمْ تَنظُرُونَ﴾ ئێوە تەماشاتان دەکرد هەندێ بروسکە لێی داو هەندێکی تەماشای دەکرد[3]. پاشان ئەوانە زیندوو کرانەوە و ئەوانی تریش بروسکە لێی دان. سوددی ئەڵێت: ﴿فَأَخَذَتْكُمُ ٱلصَّـٰعِقَةُ﴾ هەورە بروسکە بەسەرتاندا هات. هەموو مردن موسا سەلامی خوای لێبێ دەگریا و لە خوا دەپاڕایەوە دەیوت: پەروەردگارم! من چی بە نەوی ئیسرائیل بڵێم کاتێ چومەوە لایان کە تۆ هەڵبژاردەکانیانت لەناو برد: ﴿لَوْ شِئْتَ أَهْلَكْتَهُم مِّن قَبْلُ وَإِيَّـٰىَ ۖ أَتُهْلِكُنَا بِمَا فَعَلَ ٱلسُّفَهَآءُ مِنَّآ﴾[4] ئەگەر ویستت لەسەر بوایە هەر لەپێشدا دەت مراندین، ئایە دەتەوێ بەو کارە کە بێئاوەزان لە ئێمە کردیان تۆ هەموومان لەناو بەری؟ خودای گەورەموسای ئاگادار کرد، ئەو حەفتا کەسە لەوانە بوون کە گوێرەکەکەیان دەپەرست، پاشان خودای گەورە زیندوی کردنەوە، هەر یەکێ لەوانە کەزیندوی کردنەوە بە چاوی خۆیان سەیری یەکتریان دەکرد کە چۆن زیندو دەبنەوە؟ وتی: ئەمە ئەوەیە کە خودای گەورە ئەفەرموێت: ﴿ثُمَّ بَعَثْنَـٰكُم مِّنۢ بَعْدِ مَوْتِكُمْ لَعَلَّكُمْ تَشْكُرُونَ﴾[5] لە پاش ئەوەی کە مردبوون، سەر لەنوێ زیندومان کردنەوە، بەڵکو شوکرانە بژێر بن. ڕەبیعی کوڕی ئەنەس ئەڵێت: ئەو مردنەیان تۆڵە لێکردنەوەیەك بو لێیان، دوای ئەو مردنە زیندوو کرانەوە تا ئەوماوە تەمەنەکەیان دیاری کراوە تەواوی بکەن[6].

---

[1] الطبرى /۸۱/۲/ ص۶۱.
[2] ابن ابى حاتم /۱۷۰/۱.
[3] ابن ابى حاتم /۱۷۲/۱.
[4] الاعراف ۱۵۵.
[5] ابن ابى حاتم/۱۷۳/۱.
[6] ابن ابى حاتم /۱۷۳/۱.

قەتادەش هەروای وتووە[1]. عەبدلڕەحمانی کوڕی زەیدی کوڕی ئەسلەم لە تەفسیری ئەم ئایەتەدا ئەڵێت: کاتێ موسا سەلامی خوای لێبێ لەلای پەروەردگاری گەڕایەوە بە لەوحەکانەوە کە تەوراتی تێدا نوسرابوو، سەیری کرد گوێرەکە دەپەرستن. فەرمانی دا کە یەکتر بکوژن، ئەوانیش کردیان و خودا لێیان خۆش بوو. وتی: ئەم لەو حانە کتێبی خودای تێدا نوسراوە، ئەو شتانەی تێدایە کە فەرمانتان پێدەکا و ئەو شتانەشی تێدایە کە قەدەغەکراوە لێتان. وتیان: کێ بەو قسەی تۆ دەکات کە دەیڵێیت؟ بەخودا بەقسەت ناکەین تا بە ئاشکرا خودا نەبینین و خودا خۆی بۆمان دەرنەخات نەڵێت: ئەمە کتێبی منە و وەری گرن، بۆچی قسەمان لەگەڵا ناکا وەك قسەی لەگەڵ تۆدا کرد ئەی موسا؟ وە ئەم ئایەتەی خودای خوێندەوەکە ئەفەرموێت: ﴿لَن نُّؤۡمِنَ لَكَ حَتَّىٰ نَرَى ٱللَّهَ جَهۡرَةً﴾ ئێمە بڕوات پێناهێنین تا بە ئاشکرا خودا نەبینین. موسا سەلامی خوای لێبێ پێی وتن: کتێبی خودا وەرگرن، وتیان نەخێر، وتی: چ شتێکتان تووش هاتووە؟ وتیان: توشی ئەوە هاتووین، ئێمە مردوین و پاشان زیندوو بوینەتەوە. وتی: کتێبی خودا وەرگرن، وتیان: نەخێر وەری ناگرین خودای گەورە فریشتەی نارد و ئەو کێوەی بەرز کردەوە بەسەریانەوە[2]. ئەم باسە ئەوە دەگەیەنێ کە دوای ئەوە زیندو کرانەوە ئەرکیش درا بەسەریاندا. ماوەردی دوو ڕای هێناوە لەو بارەیەوە: یەکەمیان: ئەرکیان لەسەر لاچوو، چونکە بەچاوی خۆیان ئەو فەرمانەیان بە ئاشکرا بینی و ناچار بوون بڕوا بێنن. دووەم: ئەوانە ئەرکیان لەسەر لانەچوو، چونکە خاوەن ئاوەز ئەرکی لەسەر هاڵناگیرێ. قورتوبی ئەڵێت: ئەمەیان ڕاست و تەواوە، چونکە بینینی شتی ترسناك نابێتە هۆی لابردنی ئەرك لەسەریان، خۆ نەوەی ئیسرائیل موعجیزەی زۆر گەورەیان بینی، کەچی لەگەڵ ئەو موعجیزانەیشا هەر ئەرکیان لەسەر بوو،ئەوە شتێکی دیار و ئاشکرایە والله أعلم.

﴿وَظَلَّلۡنَا عَلَيۡكُمُ ٱلۡغَمَامَ وَأَنزَلۡنَا عَلَيۡكُمُ ٱلۡمَنَّ وَٱلسَّلۡوَىٰۖ كُلُواْ مِن طَيِّبَٰتِ مَا رَزَقۡنَٰكُمۡۚ وَمَا ظَلَمُونَا وَلَٰكِن كَانُوٓاْ أَنفُسَهُمۡ يَظۡلِمُونَ ٥٧﴾

### سێبەر کردن بۆیان و ناردنی گەزۆ و شێلاقە بۆیان

کاتێ خودای گەورە باسی ئەو بەڵایانەی کردکە لەسەر نەوەی ئیسرائیل لای برد، دیسان باسی ئەو بەهرانە دەکا کە خودای گەورە پێی بەخشیونو ئەفەرموێت: ﴿وَظَلَّلۡنَا عَلَيۡكُمُ ٱلۡغَمَامَ﴾ هەوریشمان کردە سێبەر بەسەرتانەوە. ﴿ٱلۡغَمَامَ﴾ کۆی (غمامە)چونکە ئاسمان دەکا بە هەور، واتە: بەری ئاسمان

---

[1] ابن ابی حاتم /١/١٧٣.

[2] الطبری /٢/٨٨ ص٦٢.

دەگرێ و دای دەپۆشێ، لە هەوری سپی پێك دێ. لە بیاباندا لەژێریدا بوون تا لە گەرمای خۆر بیان پارێزێ. ئیبنو ئەبی حاتەمیش هەروای وتووە. ڕیوایەت کراوە لە ئیبنو عومەرو ڕەبیعی کوڕی ئەنەس و ئەبی میجلەو زەححاك و سوددیەوە هەر وەك ئیبنو عەباس ئەڵێت[1]. حەسەن وقەتادەش ئەڵێن: ﴿ وَظَلَّلْنَا عَلَيْكُمُ الْغَمَامَ ﴾ هەورمان کردە سێبەر بەسەرتانەوە، ئەمە لە دەشتا بووە هەور بووە بەسێبەر بە سەریانەوە بۆ پاراستنیان لە خۆر[2]. ئیبنو جەریر ئەڵێت: ئەو هەورە، هەورێکی سارد تر بووەو لەم هەورەش چاکترو خۆشتریش بووە[3]. وە ئەفەرموێت: ﴿وَأَنزَلْنَا عَلَيْكُمُ الْمَنَّ وَالسَّلْوَىٰ ﴾ گەزۆو مەلی شێلاقەشمان بۆ ناردن. عەلی کوڕی ئەبو تەلحە لە ئیبنو عەباسەوە ئەڵێت: گەزۆیان بۆ دەباریە سەر درەختەکان سەر لەبەیانی بۆی دەچون و بە ئارەزوی خۆیان لێیان دەخوارد. قەتادە ئەڵێت: گەزۆ بەسەریاندا دەباری لە شوێنی خۆیاندا وەك بەفر. لە شیر زۆر سپی تر بوو، وە لە هەنگوینیش شیرین تر بوو، لە هەڵاتنی خۆرەوە بۆ هەڵاتنی خۆر، هەر پیاوێ بە ئەندازەی پێویستی ئەو ڕۆژەی خۆی هەڵدەگرت، ئەگەر زیادە ڕەوی بکردایە لەوەی خۆی نەدەما و خراپ دەبوو، کاتێ کە ڕۆژی شەشەم دەهات، کە ڕۆژی هەینیەکەی بوو، بەشی ڕۆژی شەشەم و حەوتەمی هەڵدەگرت. چونکە ئەو ڕۆژە جەژن بوو، ڕۆژی بژێوی پەیدا کردن و گەڕن بە شوێن بژێویدا نەبوو، ئەمە هەمووی لە دەرو دەشت بوو. ئەو گەزۆ بەناو بانگە، ئەگەر بەتەنیا بخورایە خۆراك بوو بەلەزەتیش بوو، خۆ ئەگەر تێکەڵاوی ئاو بکرایە دەبوو بە خواردنەوەیەکی چاك و خۆش. وە ئەگەر تێکەڵاوی شتێکی تریش بکرایە،دەبووە جۆرێکی تر. بەڵام ئەمە بە تەنیا مەبەستی ئایەتەکە نیە، بەڵگەشمان بۆ ئەوە،ئەم فەرمودەی بوخایە کە ڕیوایەتی کردووە لە سەعیدی کوڕی زەیدەوە ڕەزای خوای لێبێ ئەڵێت: پێغەمبەر(ﷺ) فەرمویەتی: دۆمەڵان(الكمأة)لە گەزۆیە، ئاوەکەیشی شیفایە بۆ چاو[4]. ئەم فەرمودە ئیمامی ئەحمەدیش ڕیوایەتی کردووە[5]. زانایانی فەرمودە ڕیوایەتیان کردووە جگە لە ئەبو داود. تیرمزی ئەڵێت: فەرمودەیەکی حەسەنی سەحیحە[6]. وە تیرمزی ڕیوایەتی کردووە لە ئەبو هورەیرەوە ئەڵێت: پێغەمبەری خودا(ﷺ) فەرمویەتی: خورمای عجوە لەبەهەشتەوەیە، شیفای تێدایە بۆ ژەهرو

---

[1] ابن ابی حاتم /١/١٧٤ ص٦٢.
[2] الطبری /٢/٩١.
[3] ابن ابی حاتم /١/١٧٦.
[4] فتح الباری /٨/١٤.
[5] أحمد /١/١٨٧ /سە حیحە.
[6] فتح الباری /٨/١٤/، مسلم/٣/١٦١٩/، تحفة الاحوذی/٦/٢٣٥/، النسائی فی الکبراء/٤/٣٧٠/، ابن ماجة/٢/١١٤٣.

دۆمەلآن لە گەزۆیە ئاوەكەی شیفایە بۆ چاو[١]. تەنیا ترمیزی خۆی هێناویەتی[٢]. بەلآم مەلی شێلاقە (السلوی) عەلی كوڕی ئەبو تەلحە لە ئیبنو عەباسەوە ئەلێت: وتی: مەلی شێلاقە لە مەلی سەمانی دەچیٚ. كە نەوەی ئیسرائیل لێیان دەخوارد. سودی ڕیوایەتی كردووە لە ئیبنو عەباس و ئیبنو مەسعودو هەندیٚ لە هاوەلآنی پێغەمبەرەوە(ﷺ) وتویانە: مەلی شێلاقە لە باڵندەی سەمانی دەچیٚ[٣]. موجاهید و شەعبی و زەححاك و حەسەن و عیكرەمە و ڕەبیعی كوڕی ئەنەسیش ڕەحمەتی خوایان لێبیٚ هەروایان وتووە[٤]. عیكرەمە ئەلێت: شیلاقە باڵندەیەكە وەك باڵندەیەك لە باخدا، گەورەتر لە چۆلەكە یان لە شێوەی ئەو بووە[٥]. قەتادە ئەلێت: شێلاقە لە باڵندەیەكی مەیلەو سوور چوە، بای باشور كۆی دەكردەوە بۆیان. هەركەسەو بە پێی پێویستی خۆی لەو ڕۆژەدا لێی سەر دەبڕین، ئەگەر زیاتری سەربڕیایە،ن هدەماو خراپ دەبوو. تا ڕۆژی شەشەمی كە ڕۆژی هەینی بوو، بەپێی پێویستی خۆی هەڵی دەگرت بۆ ڕۆژی شەشەم و حەوتەمیش، چونكە ئەو ڕۆژە، ڕۆژی خوا پەرستی بوو، كەس هیچی نەدەویست و بەدوایدا نەدەچوو[٦]. پاشان خودای گەورەئەفەرموێت: ﴿كُلُوا۟ مِن طَيِّبَٰتِ مَا رَزَقْنَٰكُمْ﴾ بخۆن لەو بژێویە پاكەی بەشمان داوون: ﴿وَمَا ظَلَمُونَا وَلَٰكِن كَانُوٓا۟ أَنفُسَهُمْ يَظْلِمُونَ﴾ ئەوان ناهەقیان لە ئێمە نەكرد دەربارەی خۆیان ناهەق بوون. واتە: فەرمانمان پێدان لە بجێویە بخۆن كە پێمان داون و خوا پەرستی بكەن. وەك لە ئایەتێكی ترا فەرمویەتی: ﴿كُلُوا۟ مِن رِّزْقِ رَبِّكُمْ وَٱشْكُرُوا۟ لَهُۥ﴾[٧] لەم بژێویەی پەروەردگارتان پێی داون بخۆن و شوكرانە بژێر بن، بەلآم ئەوان دژایەتیان كردوو حاشایان كرد و ناهەقیان لە خۆیان كرد، لەگەڵ ئەو هەموو نیشانە و بەڵگە و موعجیزانە كە بەچاوی خۆیان بینیان.

**ڕێزی هاوەلآنی موحەممەد (ﷺ) بەسەر هاوەلآنی كۆی پێغەمبەرەكاندا سەلامی خوایان لێبیٚ**

ئالێرەدا ڕێزو قەدری هاوەڵەكانی پێغەمبەر(ﷺ)دەردەكەویٚ ڕەزای خودا لەوان و لە هەموو هاوەلآنی پێغەمبەران لە خۆڕاگری و كۆڵنەدان و ئازار پێنەگەیاندن، لەگەڵ ئەو هەموو سەفەرو

---

[١] تحفة الاحوذی /٦/٢٣٣/ حه سه نة ص٦٢.

[٢] تحفة الاحوذی /٦/٢٣٥.

[٣] الطبری /٢/٩٦.

[٤] ابن ابی حاتم /١/١٧٨/ص٦٣.

[٥] ابن ابی حاتم /١/١٧٩.

[٦] ابن ابی حاتم /١/١٧٩.

[٧] سباء ١٥.

غەزایانەدا کردوویانە لە خزمەت پێغەمبەری خودا(ﷺ) لەوانە غەزای تەبووك لەو کەماو زۆرەی هاوینەو بەو ناڕەحەتیە کە داوای موعجیزەیان لێنەکردووە کە بیکا. دیارە ئەوە زۆر ئاسان بووە بۆ پێغەمبەری خودا(ﷺ) بەڵام کاتی وا بووە برسیەتی زۆری بۆ هێناون. داوای زۆرکردنی خواردەمەنیان لێکردووە، ئەوەی بویانە کۆیان کردوەتەوە، شتێکی کەمیش بووە هێناویانە، لە خوا پاڕاوەتەوە بە سەریدا، فەرمانی پێداون هەرکەسەو دەفرەکەی کە پێی بووە پڕی کردووە لێی، وە هەر بەو جۆرە کاتێ کە پێویستیان بە ئاو هەبووە پێغەمبەر(ﷺ) لە خودا پاڕاوەتەوە، هەورێکیان بۆ هاتوەو بارانی باراندوە بەسەریاندا، ئاویان لێخواردوەتەوەو وشترەکانیان لێ ئاو داوە و کونەو جەوەنەکانیشیان پڕکردووە، پاشان سەیریان کردووە بارانەکە لە لەشکرەکەی ئەوان تێنەپەڕیووە. ئا ئەمە جۆری شوێنکەوتنی تەواوە لەگەڵ دەسەلاتی خودا و چاودێری پێغەمبەری خودا (ﷺ).

﴿وَإِذْ قُلْنَا ٱدْخُلُوا۟ هَٰذِهِ ٱلْقَرْيَةَ فَكُلُوا۟ مِنْهَا حَيْثُ شِئْتُمْ رَغَدًا وَٱدْخُلُوا۟ ٱلْبَابَ سُجَّدًا وَقُولُوا۟ حِطَّةٌ نَّغْفِرْ لَكُمْ خَطَٰيَٰكُمْ ۚ وَسَنَزِيدُ ٱلْمُحْسِنِينَ ﴿٥٨﴾ فَبَدَّلَ ٱلَّذِينَ ظَلَمُوا۟ قَوْلًا غَيْرَ ٱلَّذِى قِيلَ لَهُمْ فَأَنزَلْنَا عَلَى ٱلَّذِينَ ظَلَمُوا۟ رِجْزًا مِّنَ ٱلسَّمَآءِ بِمَا كَانُوا۟ يَفْسُقُونَ ﴿٥٩﴾﴾

## سەرپێچی جوولەکە دوای سەرخستن لە جیێی شوکرانە بژێری خوادا

خودای گەورە ئەفەرموێت: ﴿وَإِذْ قُلْنَا ٱدْخُلُوا۟ هَٰذِهِ ٱلْقَرْيَةَ فَكُلُوا۟ مِنْهَا حَيْثُ شِئْتُمْ رَغَدًا وَٱدْخُلُوا۟ ٱلْبَابَ سُجَّدًا وَقُولُوا۟ حِطَّةٌ نَّغْفِرْ لَكُمْ خَطَٰيَٰكُمْ ۚ وَسَنَزِيدُ ٱلْمُحْسِنِينَ﴾ ئەوسایش پێمان ڕاگەیاندن: بڕۆنە ناو شارەکەوە، هەر شتێك دەخۆن و چی دەخۆنەوە، بە ئارەزوی خۆتان بکەن، هەر لە دەرگا چوونە ئەو دیوو، سوژدە بەرن و بڵێن: ئەی پەروەردگارمان! ئەرکی گرانمان مەخە سەر، ئەوسا ئێمە لە گوناهتان خۆش دەبین و پاداشتمان لەسەر کار چاکان زیاد دەکەین. خودای گەورە سەرزەنشتیان دەکا لەسەر خۆ لادان لە جیهاد کردن، نەچوونیان بۆ ناو شاری قودسی پیرۆز کاتێ کە موسا سەلامی خوای لێبێ لە وڵاتی میسرەوە هاتن، فەرمانی پێدان کە بچنە ناو ئەو زەمینە پیرۆزەوە. بجەنگن دژی ئەو عەمالیقە خوانەناسانە کە لەناویدان. نەیان توانی دژیان بجەنگن و و خۆیان بە بێ دەسەلات و لاواز دایە قەلەم. خودای گەورە دوری خستنەوەو توشی چۆڵەوانیەکی کردن وەك تۆڵە لێکردنەوەیەك. وەك خودای گەورە لە سوورەتی مائیدەدا باسی کردووە. هەر بۆیە ڕاسترین قسە ئەوەیە کە ئەو شارە قودسی پیرۆز بووە وەك سوددی و ڕەبیعی کوڕی ئەنەس و قەتادە و ئەبو موسلیمی ئەسفەهانی و کەسانی تریش وتویانە[1]. خودای گەورە دەربارەی موسا سەلامی خوای لێبێ کە وتویەتی، ئەفەرموێت:

---

[1] ابن ابی حاتم /١/١٨١ ص٦٣.

﴿ يَٰقَوۡمِ ٱدۡخُلُواْ ٱلۡأَرۡضَ ٱلۡمُقَدَّسَةَ ٱلَّتِي كَتَبَ ٱللَّهُ لَكُمۡ وَلَا تَرۡتَدُّواْ ﴾[1] گەلەکەم بچنە سەر ئەو زەمینە پیرۆزەی کە خودا بۆ ئێوەی بڕیار داوە و بۆتان نوسراوە و بەرەو پاش مەگەڕێنەوە. هەندێ تر وتویانە: ئەو شارە ئەریحا بووە. ڕیوایەتیش کراوە لە ئیبنو عەباس و عەبدولڕەحمانی کوڕی زەیدەوە. هەر بەو شێوەیە بوو تا لە چۆڵەوانی و بیابانەکە دەرچووندوای چل ساڵ لەگەڵ یوشعی کوڕی نون سەلامی خوای لێبێ خودای گەورە لە ئێوارەی هەینیدا سەری خستن. لەو ڕۆژەدا خوا کەمێك خۆری بۆ گرتن (بەندکردن) تا سەرکەوتنەکە بەدەست بێنن. کاتێ کە سەرکەوتنەکەیان بەدەست هێنا. فەرمانیان پێدرا لە دەرگای شارەکەوە بچنە ژورەوە ﴿سُجَّدٗا﴾بە سوژدە بردن. سوپاسی خودای گەورە بکەن لەسەر ئەو بەهرانەی کە پێی بەخشیون لەو یارمەتی و سەرکەوتنانە و شارەکەی بۆ گێڕانەوە و لەو چۆڵەوانی و گومڕاییە ڕزگاری کردن. عەوفی ئەڵێت: لە تەفسیرەکەیدا لە ئیبنو عەباسەوە لەم ئایەتەدا–و أدخلوا باب سجدا– هەر لە دەرگا چوونە ژورەوە سوژدە بەرن. ئەڵێت: یانی: ڕکوع بەرن[2].

وە ئیبنو جەریر ڕیوایەتی کردووە لە ئیبنو عەباسەوە ﴿وَٱدۡخُلُواْ ٱلۡبَابَ سُجَّدٗا﴾ .لە دەرگاوە بچنە ژورەوە سوژدە بەرن، وتی: لە دەرگایەکی بچوکەوە ڕکوع بەرن. حاکمیش ڕیوایەتی کردووە، ئیبنو ئەبی حاتەم ئەمەی بۆ زیاد کردووە: بە قنگە خشکێ چوونە ژورەوە. حەسەنی بەسری ئەڵێت: فەرمانیان پێکرا سوژدە بەرن بە دەم وچاویان لە کاتی چونە ژورەوەدا. ڕازی ئەمەی بە دوور زانیوە. وە هەندێکی تریان وتویانە: مەبەست لێرەدا بە سوژدە برن گەردن کەچی بووە، لەبەر گرانی هەڵگرتنی لەسەر هەقیقەتەکەی خۆی. خوسەیف ئەڵێت: عیکرەمە لە ئیبنو عەباسەوە ئەڵێت: ئەو دەرگایە ڕووەو قیبلە بووە. ئیبنو عەباس و موجاهید و سوددی و قەتادە و زەححاك ئەڵێن: ئەوە دەرگای حیتە بوە لە دەروازەی ئیلیانەوە یانی: قودسی پیرۆز. ڕازی گێڕاویەتیەوە لە هەندێکی تریانەوە کەمەبەست بەو دەرگایە، ڕویەك بووە لە ڕەوەکانی قیبلە. خوسەیف لەعیکرەمەوە لە ئیبنو عەباسەوە ئەڵێت: چوونە ژورەوە لەسەر لا سوددی ئەڵێت: لە ئەبو سەعیدی ئەزدیەوەلە ئەبو کونودەوە لە عەبداللەی کوڕی مەسعودەوە. پێیان وترا: ﴿وَٱدۡخُلُواْ ٱلۡبَابَ سُجَّدٗا﴾ وە لە دەرگاوەبچنە ژورەوە بەمل کەچی. چوونە ژورەوە سەریان بەرز کردبووەوە[3] ﴿مُقۡنِعِي رُءُوسِهِمۡ﴾ بە پێچەوانەی ئەوە کە فەرمانیان پێکرابوو. پاشان خودای گەورە ئەفەرموێت: ﴿وَقُولُواْ حِطَّةٞ﴾ ئەی خودایە ! لە گوناهمان خۆش ببە. ئیبنو عەباس

---

[1] المائیدة ٢١. الرازی /٣/٨٢.
[2] الطبری /٢/١١٣ ص٦٤.
[3] ابن ابی حاتم /١/١٨٣/ص٦٤.

ئەڵێت: لە گوناهمان خۆش ببە، داوای لێخۆشبوون بکەن[1]. حەسەن و قەتادە ئەڵێن: واتە: گوناهەکانمان لەسەر لابەرە[2]. خودای گەورە ئەفەرموێت: ﴿نَّغۡفِرۡ لَكُمۡ خَطَٰيَٰكُمۡۚ وَسَنَزِيدُ ٱلۡمُحۡسِنِينَ﴾ ئەوسا لە گوناهەکانتان خۆش دەبین و پاداشتمان لەسەر کارەچاکەکان زیاد دەبێ. ئەڵێت: ئەمە وەڵامی ئەو فەرمانەیە. واتە: ئەگەر هەڵسان بەو کارەی کە فەرمانمان پێاون لە تاوانەکانتان خۆش دەبین و چاکەکانیان چەند بارە دەکەینەوە. کورتەی مەبەستەکە ئەوەیە، ئەوانە فەرمانیان پێکرا کە ملکەچی فەرمانی خودا بن لە کاتی سەر کەوتنەکەدا بەکردارو بە گفتاریش دان بنێن بە تاوانەکانیاندا و داوای لێخۆش بوون لە خودا بکەن لەو گوناهانە و شوکرانە بژێری ئەو بەهرانەش بن و هەوڵ بدەن و پەلە بکەن بۆ بەدەست هێنانی ئەو بەهرانە بە تەوبە کردن و گەڕانەوە بۆ لای خوای گەورە. وەک ئەفەرموێت: ﴿إِذَا جَآءَ نَصۡرُ ٱللَّهِ وَٱلۡفَتۡحُ ۝١ وَرَأَيۡتَ ٱلنَّاسَ يَدۡخُلُونَ فِي دِينِ ٱللَّهِ أَفۡوَاجٗا ۝٢ فَسَبِّحۡ بِحَمۡدِ رَبِّكَ وَٱسۡتَغۡفِرۡهُۚ إِنَّهُۥ كَانَ تَوَّابَۢا﴾[3] هەرکاتێ یارمەتی خودا گەیشتە ئێوەو سەرکەوتن. خەڵکیش دێ کۆمەڵ کۆمەڵ دێنە ناو ئاینی خوداوە. هەر سوپاس و شوکری پەروەردگارت بکە و داوای لێخۆشبوونی لێبکە. ئەو هەمیشە پەشیمانی پەشیمانان قبوڵ دەکا. خودای گەورە ئەفەرموێت: ﴿فَبَدَّلَ ٱلَّذِينَ ظَلَمُواْ قَوۡلًا غَيۡرَ ٱلَّذِي قِيلَ لَهُمۡ﴾ ئەوسا ستەمکاران هەرچی بەوان سپێرابوو بە پێچەوانە ڕەفتاریان کرد. بوخاری ڕیوایەتی کردووە لە ئەبو هورەیرەوە ڕەزای خوای لێبێ لە پێغەمبەرەوە(ﷺ) ئەفەرموێت: بەنەوەی ئیسرائیل وترا لە دەرگاکەوە بچنە ژورەوە بە کڕنوشەوە بڵێن: گوناهەکانمان لێهەڵوەرێنە کەچی ئەوان گۆڕییان بە قنگە خشکێ چوونە ژورەوەو دەیان وت: دانەوێڵەیەک لە مویەکدا[4]. نەسائی بە مەرفوعی ڕیوایەتی کردووە. وە لەم وتەیەدا کە خودای گەورە ئەفەرموێت: ﴿حِطَّةٞ﴾ وتی: گۆڕیان و وتیان: دانەوێڵەیەک (حبة)[5]. عەبدورەزاقیش هەر بەم جۆرە ڕیوایەتی کردووە لە بوخاری و مسلیم و تەرمزیەوە[6]. تیرمزی ئەڵێت: فەرمودەیەکی حەسەنی سەحیحە. پوختەی ئەوەی کە زانایانی تەفسیر باسیان کردووە ئەوەیە کە فەرمانەکەی خودایان گۆڕی کە بە ملکەچی بە کردارو گفتارەوە بچنە ژورەوەو کڕنوش بەرن. کەچی ئەوان بەقنگە خشکێ چوونە

---

[1] ابن ابی حاتم /١/١٨٣.
[2] ابن ابی حاتم /١/١٨٥.
[3] النصر ١-٣.
[4] فتح الباری /٨/١٤ ص٦٤.
[5] النسائی فی الکبری /٦/٢٨٦.
[6] تحفة الاحوذی /٨/٢٩١.

زۆرەوە بە دوادا و سەریان بەرز کردبوەوە فەرمانیان پێکرابوو کە بڵێن: (حطه فی شعیره) دانەوێڵەیەك لە مویەکدا، ئیتر ئەمە ئەو پەڕی لاساری و دژایەتی بوو. هەر بۆیە خودای گەورە ئەو سزا گەورەی بۆ ناردن بە هۆی ئەو دەرچونەیان لە فەرمانی. ئەفەرموێت: ﴿فَأَنزَلْنَا عَلَى الَّذِينَ ظَلَمُوا رِجْزًا مِّنَ السَّمَاءِ بِمَا كَانُوا يَفْسُقُونَ﴾ ئەوسا ئێمەش لە تۆڵەی ئەو بەدفەرپەیدا بەلآیەکمان لە ئاسمانەوە بۆ ناردن. زەححاك لە ئیبنو عەباسەوە ئەڵێت: هەموو شتێ لە کتێبی خوادا هەبێ لە (الرجز) مەبەست پێی سزایە[1]. هەر بەو جۆرە ڕیوایەت کراوە لە موجاهید و ئەبو مالیك و سوددی و حەسەن و قەتادەوە کە مەبەست پێی سزایە[2]. ئیبنو ئەبی حاتەم ڕیوایەتی کردووە لە سەعدی کوڕی مالیك و ئوسامەی کوڕی زەید و خوزەیفەی کوڕی سابیتەوە ڕەزای خوایان لێبێ وتیان: پێغەمبەری خودا(ﷺ) ئەفەرموێت: چاوە قوڵە –تاعون– ڕیجزێ بووە –رجز– سزایەك بووە؟ سزای ئەوانەی پێش ئێوەیان پێدراوە[3]. نەسائیش هەروا ڕیوایەتی کردووە[4]. ئەسڵی فەرمودەکە لە هەردوو سەحیحەکەدا هاتووە: ئەگەر بیستان چاوە قوڵە لەسەر زەمینێکایە مەچنە ناوی[5]. ئیبنو جەریر ڕیوایەتی کردووە لە ئوسامەی کوڕی زەیدەوە لە پێغەمبەری خوداوە (ﷺ) فەرمویەتی: بێگومان ئەم ئازارو نەخۆشیانە ڕیجزێ بووە هەندێ لە گەلانی پێش ئێوەی پێ سزا دراوە[6]. ئەصلی ئەم فەرمودە لە هەردوو سەحیحەکەدا هاتووە[7].

﴿وَإِذِ اسْتَسْقَىٰ مُوسَىٰ لِقَوْمِهِ فَقُلْنَا اضْرِب بِّعَصَاكَ الْحَجَرَ ۖ فَانفَجَرَتْ مِنْهُ اثْنَتَا عَشْرَةَ عَيْنًا ۖ قَدْ عَلِمَ كُلُّ أُنَاسٍ مَّشْرَبَهُمْ ۖ كُلُوا وَاشْرَبُوا مِن رِّزْقِ اللَّهِ وَلَا تَعْثَوْا فِي الْأَرْضِ مُفْسِدِينَ (٦٠)﴾

## هەڵقولانی دوازدە کانی

خودای گەورە ئەفەرموێت: ﴿وَإِذِ اسْتَسْقَىٰ مُوسَىٰ لِقَوْمِهِ فَقُلْنَا اضْرِب بِّعَصَاكَ الْحَجَرَ ۖ فَانفَجَرَتْ مِنْهُ اثْنَتَا عَشْرَةَ عَيْنًا ۖ قَدْ عَلِمَ كُلُّ أُنَاسٍ مَّشْرَبَهُمْ ۖ كُلُوا وَاشْرَبُوا مِن رِّزْقِ اللَّهِ وَلَا تَعْثَوْا فِي الْأَرْضِ مُفْسِدِينَ﴾ ئەوکاتەش کەوا موسا ئاوی بۆ هۆزەکەی خواست. وتمان: بەدار عەساکەی خۆت لەو بەردە بدە، دوانزە کانی لێ هەڵقوڵێ، هەرتیرەیەك جێی ئاو خواردنی خۆی بزانێ. وە لەو بەشەیش خودا داویە

---

[1] الطبری /٢/١١٨.

[2] ابن ابی حاتم /١/١٨٧.

[3] ابن ابی حاتم /١/١٨٦.

[4] النسائی فی الکبری /٤/٣٦٢/ سه حیحه.

[5] فتح الباری /١٠/١٨٩، مسلم/٤/١٧٣٩.

[6] الطبری /٢/١١٦.

[7] فتح الباری /٦/٥١٢/مسلم/٤/١٧٣٧.

بخۆن و بخۆنەوە. خوای گەورە ئەفەرمویێت: ئەو بەهرەی منە و بیری خۆتانی بێننەوە، کە وەڵامی پێغەمبەرەکەتانم موسا سەلامی خوای لێبێ دایەوە کە داوای ئاوی بۆ کردن، بەئاسانی ئاوم بۆ دەرهێنان لە بەردێك لەگەڵ خۆتانە. ردوانزە کانیم لێهەڵقولاّن،ربۆ هەر تیرەیەك لەو تیرانە کانیەك بۆ خۆی. گەزۆو شێلاقەش بخۆن و لەو ئاوەیش بخۆنەوە کە بۆم هەڵقولاّندن، بەبێ هیچ ماندوو بوون و ناڕەحەتیەك. ئەو کەسە بپرستن کە ئەوەی بۆ ڕام هێناون: ﴿وَلَا تَعْثَوْا فِي الْأَرْضِ مُفْسِدِينَ﴾ لەزەویدا بەدفەڕی مەکەن. لەباتی ئەو بەهرانە سەرپێچی و لاساری مەکەن، زانایانی تەفسیر لەم بارەیەوە دواون، وەك ئیبنو عەباس ڕەزای خوای لێبێ ئەڵێت: بەردێکی چوارگۆشە لەلای خۆیان بوو، فەرمان درا بە موسا سەلامی خوای لێبێ بەدار عەساکەی لێیدا، دوانزە کانی لێهەڵقولاّ‌هەر لایەکی بەردەکەوە سێ کانی لێهەڵقولاّ، هەر تیرەو کانی خۆی دەناسی و ئاوی لێدەخواردەوە، بۆ هەرشوێنێ نەیان دەگواستەوە مەگین ئەو بەردە لەو شوێنەدا لەگەڵیان بوو وەك چۆن لە شوێنی یەکەمدا لەگەڵیان بوو.[1]

ئەم بەسەرهاتە لەو بەسەر هاتە دەچێ کە لە سورەتی ئەعرافدایە؟ بەلاّم ئەو بەسەرهاتە لە مەککە هاتووە، چونکە کە باسکراوە بە زەمیری غائب باس کراوە، خودای گەورە ئەو بەسەرهاتەی بۆ پێغەمبەر باس کردووە کە چی بەسەر هێناون، بۆیە لەم سوورەتی بەقەرەدا کە لە مەدینە هاتۆتە خوارەوە ڕووی وتارەکە لەمان کراوە. وە لە سوورەتی ئەعرافدا خودای گەورە باسی کردووە و ئەفەرموێت: ﴿فَانْبَجَسَتْ مِنْهُ اثْنَتَا عَشْرَةَ﴾[2] دوانزە کانی لەبەردەکەوە هەڵقولێن. ئەوە سەرەتای هەڵقولینەکە بووە. لێرەدا باسی هەڵقولاّنەکە بە تەواوی دەکا، باسی هەردوو هەڵقولاّنەکە لەوێش و لێرەشا جێی خۆیەتی و الله أعلم.

﴿وَإِذْ قُلْتُمْ يَا مُوسَىٰ لَن نَّصْبِرَ عَلَىٰ طَعَامٍ وَاحِدٍ فَادْعُ لَنَا رَبَّكَ يُخْرِجْ لَنَا مِمَّا تُنبِتُ الْأَرْضُ مِن بَقْلِهَا وَقِثَّائِهَا وَفُومِهَا وَعَدَسِهَا وَبَصَلِهَا ۖ قَالَ أَتَسْتَبْدِلُونَ الَّذِي هُوَ أَدْنَىٰ بِالَّذِي هُوَ خَيْرٌ ۚ اهْبِطُوا مِصْرًا فَإِنَّ لَكُم مَّا سَأَلْتُمْ﴾

### داوای خواردنی خراپیان کرد لە جێی گەزۆو شێلاقە

خودای گەورە ئەفەرموێت: ئەو بەهرانەی من وەبیر خۆتان بێنن کە بۆم ناردن لە گەزۆو مەلی شێلاقە کە خۆاردنێکی زۆر چاك و بەسوود وئاسان بوو، ئەوەش لە بیر مەکەن کە ناڕەزایتان دەربڕی لەو بژێویەی کە پێمان دابوون. داواتان کرد لە موسا کە بۆتان بگۆڕێ بە خواردنێکی خراپ و کەم

[1] الطبری /٢/١٢٠ ص١٦٥.
[2] الاعراف ١٦٠.

سوود کە سەوزەوات و ئەوانەی تر کە داواتان کرد. حەسەنی بەسری ئەڵێت: خۆیان لەسەر ئەو نازو نیعمەتە ڕانەگرت و لە خۆبایی بوون، حەزیان لەو ژیانەی پێشوی خۆیان بوو، کە خەریکی خواردنی نیسك و پیازو سەوزەوات بوون وەك خودای گەورە ئەفەرموێت: ﴿يَـٰمُوسَىٰ لَن نَّصۡبِرَ عَلَىٰ طَعَامٖ وَٰحِدٖ فَٱدۡعُ لَنَا رَبَّكَ يُخۡرِجۡ لَنَا مِمَّا تُنۢبِتُ ٱلۡأَرۡضُ مِنۢ بَقۡلِهَا وَقِثَّآئِهَا وَفُومِهَا وَعَدَسِهَا وَبَصَلِهَا﴾ ئەو کاتەشتان لە بیر بێ کەوتان: موسا ئێمە بەیەك جۆرە خۆراك خۆمان بۆ ڕاناگیرێ، لەپەروەردگارت بخوازە لەوەی لە زەوی دەیڕوێنێ، وەك سەوزەوات و خەیارو نیسك و پیاز و سیر بۆمان بەبەرهەم بێنێ. بۆیە وتیان: ﴿عَلَىٰ طَعَامٖ وَٰحِدٖ﴾ چونکە ئەوان گەزۆو مەلی شێلاقەیان دەخوارد. گۆڕانی بەسەردا نەدەهات هەموو ڕۆژێ هەر ئەو خواردنەیان دەخوارد. سەوزەوات و نیسك و خەیارو پیاز هەمووی ناسراو بوو. بەڵام (فوم) لە خوێندنەوەی ئیبنو مەسعودا بە(ثومها). ئیبنو ئەبی حاتەم ڕیوایەتی کردووە لە حەسەنەوە ئەڵێت: (و فومها) لە ئیبنو عەباسەوە ئەڵێت: سیر (الثوم)[1]. ئیبنو عەباس ئەڵێت: لە زمانی پێشیناندا وتراوە: (فوموا لنا) واتە: نانمان بۆ بکەن. ئیبنو جەریر ئەڵێت: ئەگەر ئەوە ڕاست بوبێ، ئەوە لە پیتە گۆڕاوەکانە وەك وتویانە: ( وقعوا فی عاثور شر، و عافور شر؟ و أثافی و أثاثی و مغاضیر و مغاثیر)وێنەی ئەمانە کە پیتی فاء گۆڕاوە بە پیتی ثاء. (تاء) گۆڕاوە بە ( فاء) لەبەر نزیکی مەخرەجەکەیان[2] و الله أعلم. هەندێکی تر دەڵێن: (الفوم) یانی: گەنم. ئەو گەنمەی کە نانی لێدروست دەکرێت. بوخاری ئەڵێت: هەندێکی تر وتویانە: ئەو دانەوێڵانەی کە دەخورێن هەموویان فومیان پێدەوترێت. پاشان خودای گەورە ئەفەرموێت: ﴿قَالَ أَتَسۡتَبۡدِلُونَ ٱلَّذِي هُوَ أَدۡنَىٰ بِٱلَّذِي هُوَ خَيۡرٌ﴾ وتی: ئێوە خراپ بە چاك دەگۆڕنەوە؟ ئەمە سەرزەنشت کردن و سەرکۆنە کردنە بۆیان لەسەر داواکردنی ئەو خواردنە خراپانە و واز هێنان لە ژیانە چاك و خواردنە پاك و بەسوودانی کە پێیان بەخشراوە: ﴿ٱهۡبِطُواْ مِصۡرٗا﴾ سەربەرەو ژێر بچنە شارێك دڵخوازی ئێوە لەوێیە. ئیبنو عەباس ئەڵێت: شارێك لە شارەکان[3]. ئیبنو جەریر ڕیوایەتی کردووە لە ئەبو لعالیە و ڕەبیعی کوڕی ئەنەسەوە کە وتویانە ئەو شارە شارەکەی فیرعەون بووە[4]. بەڵام لە ڕاستیدا مەبەست شارێك بووە لەو شارانە. وەك ڕیوایەت کراوە لە ئیبنو عەباس و کەسانی تریشەوە. ماناکەی ئەوەیە، چونکە موسا بە هۆزەکەی وت:

---

[1] ابن ابی حاتم /١/١٩٣ ص٦٥.

[2] الطبری /٢/١٣٠.

[3] ابن ابی حاتم /١/١٩٤.

[4] الطبری /٢/١٣٤.

ئەوەی ئێوە داواتان کردووە شتێکی گران و ناڕەحەت نیە بەڵکو ئەو شتانە لە هەموو ولاتێکا هەیە و زۆریشە کە چوونە ناوی. ئەوەندە شتێکی خراپە و زۆریشە لەو شارانەدا بۆ ئەوە ناشێ کە من داوای بکەم بۆتان. هەربۆیە ئەفەرموێت: ﴿أَتَسْتَبْدِلُونَ ٱلَّذِى هُوَ أَدْنَىٰ بِٱلَّذِى هُوَ خَيْرٌ ۚ ٱهْبِطُوا۟ مِصْرًا فَإِنَّ لَكُم مَّا سَأَلْتُمْ﴾ ئێوە خراپ بە چاك دەگۆڕنەوە؟ سەر بەرەو ژێر بچنە شارێك دڵخوازی ئێوە لەوێیە، واتە: ئەوەی داواتان کرد لەوێیە. لەبەر ئەوە داواکەیان لە ڕووی لە خۆبایی بوون و شەڕەوە بوو، هیچ پێویستیەکیان بەوە نەبوو. بەگوێی نەکردن و الله أعلم.

﴿وَضُرِبَتْ عَلَيْهِمُ ٱلذِّلَّةُ وَٱلْمَسْكَنَةُ وَبَآءُو بِغَضَبٍ مِّنَ ٱللَّهِ ۗ ذَٰلِكَ بِأَنَّهُمْ كَانُوا۟ يَكْفُرُونَ بِـَٔايَٰتِ ٱللَّهِ وَيَقْتُلُونَ ٱلنَّبِيِّۦنَ بِغَيْرِ ٱلْحَقِّ ۗ ذَٰلِكَ بِمَا عَصَوا۟ وَّكَانُوا۟ يَعْتَدُونَ ﴿٦١﴾﴾

## چارەڕەشی و زەبوونی بڕیاردرا بۆ جوولەکە

خودای گەورە ئەفەرموێت: ﴿وَضُرِبَتْ عَلَيْهِمُ ٱلذِّلَّةُ وَٱلْمَسْكَنَةُ﴾ چارەڕەش و زەبونیان بۆ بڕیار درا. واتە: بەشەرعی و بەقەدەریش چارەڕەش بوون و بەردەوامیش هەر چارەڕەش و زەبوون دەبن. هەر لە سەر ئەو ڕەوشتانەیانە خودا سور شۆڕو چارەڕەش و زەبوونی کردوون،لەگەڵ ئەوەیشا هەر خۆیان بۆ خۆیان چارەڕەش و زەبوونن. حەسەن ئەڵێت: خودا زەبوونی کردوون، بەرگریان لێناکرێ و خستونیەتیە بەرپێی مسوڵمانان. ئەم ئومەتە پەییان بەوە بردووە و زانیویانە. مەجوسیەکانیش سەرانەیان لێسەندوون[1]. ئەبولعالیە و ڕەبیعی کوڕی ئەنەس و سوددی ئەڵێن: ﴿وَٱلْمَسْكَنَةُ﴾ یانی: هەژاری[2]. عەتیەی عەوفی ئەڵێت: سەرانە (الخراج)[3]. خودای گەورە ئەفەرموێت: ﴿وَبَآءُو بِغَضَبٍ مِّنَ ٱللَّهِ﴾ وە بەر غەزەبی خوا کەوتن. زەححاك ئەڵێت: تووشی غەزەبی خودا هاتن[4]. ئیبنو جەریر ئەڵێت: مەبەست بە﴿وَبَآءُو بِغَضَبٍ مِّنَ ٱللَّهِ﴾ ڕۆشتن و گەڕانەوە. ناوترێ (باء)مەگین بە مەوسولێ یان بە چاکە یان بە خراپە. دەوترێ: (باء فلان بذنبه، يبوء به بوءا و بواء). وەك خودای گەورە ئەفەرموێت: ﴿إِنِّىٓ أُرِيدُ أَن تَبُوٓأَ بِإِثْمِى وَإِثْمِكَ﴾[5] من دەمەوێ تاوانی کوشتنی من وتاوانی خۆت بێتە ملت. مانای دەقەکە

---

[1] ابن ابی حاتم /١/١٩٥/١٩٦ ص٦٦.

[2] ابن ابی حاتم /١/١٩٦.

[3] ابن ابی حاتم /١/١٩٦.

[4] الطبری /٢/١٣٨.

[5] المائدة ٢٩.

ئەوەیە کە گەڕانەوەو وازیان هێنا خۆیان خستە بەر ئەو غەزەبە و خودایش غەزەبی لێگرتن[1]. خودای گەورە ئەفەرموێت: ﴿ذَٰلِكَ بِأَنَّهُمْ كَانُوا يَكْفُرُونَ بِآيَاتِ اللَّهِ وَيَقْتُلُونَ النَّبِيِّينَ بِغَيْرِ الْحَقِّ﴾ لەبەر ئەوە لە نیشانەکانی خودا حاشایان دەکرد، هەر لەناهەق پێغەمبەرانیان دەکوشت، یاخی بوون و دەستدرێژیان دەکرد. خودای گەورە ئەفەرموێت بۆیە بەو جۆرە سزامان دان و ئەو چارە ڕەش و زەبونیەمان بەسەر هێنان و تووشی غەزەبمان کردن، لەبەر خۆ بەزل زانیان بەرانبەر بە هەق و شوێن نەکەوتنی و حاشا کردنیان لە نیشانەکانی خودا و سوکایەتی کردن بە هەڵگرانی پەیامی خودا کە پێغەمبەران و شوێن کەوتوانیان بوون، بەکەم سەیریان دەکردن تا وای لێهات دەستیان دایە کوشتنیان. هیچ خوانەناسیەك لەوە گەورەتر نیە کە ئەوانە حاشایان لە نیشانەکانی خودا کردو پێغەمبەرانی خودایان بە ناهەق کوشت.

### پێناسەی خۆبەزل زانی

هەر بۆیە لە هەردوو سەحیحەکەدا هاتووە کە پێغەمبەری خودا (ﷺ) فەرموویەتی: فیززلی: پێناخۆش بوونی هەق و سوکایەتی کردنە بە خەڵك[2]. ئیمامی ئەحمەد ڕیوایەتی کردووە لە عەبدڵڵای کوڕی مەسعودەوە کە پێغەمبەری خودا (ﷺ) فەرموویەتی: توندترین سزای خەڵکی لە ڕۆژی قیامەتا پیاوێکە پێغەمبەرێکی کوشتبێ یان پێغەمبەرێ کوشتبێتی. وە ڕێبەرانی گومڕایی ئەوانەی پەیکەر دروست دەکەن[3]. خودای گەورە ئەفەرموێت: ﴿ذَٰلِكَ بِمَا عَصَوا وَّكَانُوا يَعْتَدُونَ﴾ یاخی بوون و دەستدێژیان کرد. ئەمەیش هۆکارێکی تر بوو بۆ سزادانیان لەسەری چونکە ئەوانە یاخی و دەستدرێژی کەربوون. لاساری کردن، هەڵسانە بەکرداری قەدەغەکراو، دەستدێژیش، لادانە لە سنوری دیاری کراو و ڕێگە پێدراو، و الله أعلم.

﴿إِنَّ الَّذِينَ آمَنُوا وَالَّذِينَ هَادُوا وَالنَّصَارَىٰ وَالصَّابِئِينَ مَنْ آمَنَ بِاللَّهِ وَالْيَوْمِ الْآخِرِ وَعَمِلَ صَالِحًا فَلَهُمْ أَجْرُهُمْ عِندَ رَبِّهِمْ وَلَا خَوْفٌ عَلَيْهِمْ وَلَا هُمْ يَحْزَنُونَ ﴿٦٢﴾﴾

### بڕواو ئاکاری چاك سەرچاوەی ڕزگاریە لەهەموو کاتێکدا

خودای گەورە دوای ئەوە باسی هەڵسو کەوتی ئەوانەی کرد کە سەرپێچی فەرمانەکانی دەکەن و قەدەغە کراوەکان دەپارێزن و کارێ دەکەن کە ڕێگەی پێ نەدراوەو هەڵساون بە کاری خراپ و قەدەغە کراو،چۆن سزا دران و تۆڵەیان لێسەندرا. وە ئاگاداریشی داوە دەربارەی ئەو گەلە پێشوانەش کە

---

[1] الطبری /٢/١٣٨.

[2] مسلم /١/٩٣ ص٦٦.

[3] أحمد /١/٤٠٧/ سه حیحه.

چاکەیان کردووە و گوێ ڕایەڵبوون، بە پاداشتی زۆر چاک. ئەم بڕیارەش تا ڕۆژی قیامەت بەردەوام دەبێ. هەرکەسێ شوێن ئەم پێغەمبەرە نەخوێندەوارە بکەوێ تا هەتایە بەختەوەرەو بەرەو ڕوی هیچ ترسێك نابنەوە و خەمیش ناخۆن بۆ ئەو شتانەی پێی هەڵدەستن و پاشەکەوتی دەکەن. وەك خوای گەورە ئەفەرموێت: ﴿أَلَآ إِنَّ أَوْلِيَآءَ ٱللَّهِ لَا خَوْفٌ عَلَيْهِمْ وَلَا هُمْ يَحْزَنُونَ﴾[1] باتێ بگەن کە ئەوانەی دۆستی خودان، هیچ ترسێکیان لەسەر نیە و خەمیش ناخۆن. وەك چۆن فریشتەکانیش لە کاتی سەرەمەرگدا دەڵێن بە خاوەنباوەڕان وەك خودای گەورەئەفەرموێت: ﴿إِنَّ ٱلَّذِينَ قَالُوا۟ رَبُّنَا ٱللَّهُ ثُمَّ ٱسْتَقَـٰمُوا۟ تَتَنَزَّلُ عَلَيْهِمُ ٱلْمَلَـٰٓئِكَةُ أَلَّا تَخَافُوا۟ وَلَا تَحْزَنُوا۟ وَأَبْشِرُوا۟ بِٱلْجَنَّةِ ٱلَّتِى كُنتُمْ تُوعَدُونَ﴾[2] ئەوانەش کە وتویانە: پەروەردگارمان خودایە و لە گفتیان لایان نەداوە، فریشتە دێنە لایان پێیان دەڵێن: نە بترسن، نە غەم بخۆن، مژدەتان لێبێ گەیشتوونەتە ئەو بەهەشتەی کە بەڵێنتان پێدراوە.

## پێناسەی خاوەنباوەڕ

خودای گەورە ئەفەرموێت: ﴿إِنَّ ٱلَّذِينَ ءَامَنُوا۟ وَٱلَّذِينَ هَادُوا۟ وَٱلنَّصَـٰرَىٰ وَٱلصَّـٰبِـِٔينَ مَنْ ءَامَنَ بِٱللَّهِ وَٱلْيَوْمِ ٱلْـَٔاخِرِ﴾ ئەوانەی خاوەنباوەڕن و ئەو کەسانەش کە جوولەکە و مەسیحی و سابئی مەزەب بوون، ئەگەر بە خودا و ڕۆژی دوایی باوەڕیان بێ و ئاکار چاك بن، لەلای پەروەردگاریان پاداشتی خۆیان وەردەگرن و نە هیچ ترسێکیان لەسەرە و نە خەم دەخۆن. عەلی کوڕی ئەبو تەلحە ڕیوایەتی کردووە لە ئیبنو عەباسەوەئەڵێت: پاشان خودای گەورە ئەم ئایەتەی ناردە خوارەوە کە ئەفەرموێت: ﴿وَمَن يَبْتَغِ غَيْرَ ٱلْإِسْلَـٰمِ دِينًا فَلَن يُقْبَلَ مِنْهُ وَهُوَ فِى ٱلْـَٔاخِرَةِ مِنَ ٱلْخَـٰسِرِينَ﴾[3] هەرکەسێ جگە لە ئیسلام هەر ئاینێکی دیکەی هەبێ، قبولێ نیە و لە دوا ڕۆژدا لە ڕیزی زیانبارانە. ئەمەی ئیبنو عەباس باسی کردووە ئەوەیە کە هیچ ڕێبازێ و هیچ کردارێ وەرناگیرێ مەگین ئەو ڕێبازو کردارە ڕێك بوبێ لەگەڵ شەریعەتی موحەمەد(ﷺ) دوای ئەو پەیامەی کە موحەمەد(ﷺ) پێی ڕەوانە کراوە. بەڵام لە پێش ئەوەدا، هەر کەسەو شوێنی پێغەمبەرەکەی زەمانی خۆی کەوتبێ، ئەوە ئەو کەسە لەسەرڕێی ڕاست و ڕزگاری بووە. جوولەکەیش شوێن کەوتەی موسا بوون سەلامی خوای لێبێ پەیڕەوی تەوراتیان کردووە لە زەمانی خۆیاندا.

---

[1] یونس ٦٢.

[2] فصلت ٣٠.

[3] ال عمران ٨٥. ابن ابی حاتم /١/١٩٨ ص٦٧.

### هۆی ناو نان بە جوولەکە (الیهود)

(الیهود) لە(الهوادە) وە هاتووە، مەبەست پێی خۆشەویستیە. یان (الهود) یانی: تەوبەکردن. وەك موسا سەلامی خوای لێبێ وتی: ﴿إِنَّا هُدْنَآ إِلَيْكَ﴾ ئێمە گەڕاوینەتەوە بۆ لای تۆ. واتە: تەوبەمان کردووە. وەك ئەوە لە بنەڕەتا بەوە ناوبراین، لەبەر تەوبەکردن و خۆشەویستیان بۆ یەکتری. وتراویشە: لەبەر پەیوەندی و خزمایەتیان بە یەهووداوە کوڕە گەورەکەی یەعقوب. عەمری کوڕی عەلا وتی: چونکە ئەوان لە خوێندنەوەی تەوراتا ئەجولآن (یتهودون).

### هۆی ناو نان بە نەسارا (النصاری)

کاتێ عیسا سەلامی خوای لێبێ ڕەوانە کرا، پێویست کرا لەسەر نەوەی ئیسرائیل شوێنی کەون بەرفەرمانی بن، هاوەڵەکانی ئەهلی ئاینەکەی ئەوانەنەسارا بوون. بەوە ناونران لەبەر هاوکاری و یارمەتی دانی یەکتری لەناو خۆیاندا. ئەنساریشیان پێوتراوە. وەك عیسا سەلامی خوای لێبێ وتی: ﴿مَنْ أَنصَارِيٓ إِلَى ٱللَّهِ قَالَ ٱلْحَوَارِيُّونَ نَحْنُ أَنصَارُ ٱللَّهِ﴾[1] کێ بێ لە ڕێی خودا یارمەتیم بدا؟ حواریەکان وەڵامیان داوە کە خۆمانین لە ڕای خودا یارمەتی دەرین. قەتادە و ئیبنو جورەیج ئەڵێن: بۆیە بەو ناوە ناو نران، لەبەر ئەوە لە زەویەکدا نیشتەجێ بوون پێی دەوترا ناسرە ئیبنو عەباسیش هەر وای وتووە والله أعلم[2]. وتەی (النصاری) کۆی (نصران) وەك (نشاوی) کۆی (نشوان)و (سکاری) کۆی(سکران) وە بە ژنیش وتراوە (نصران). کاتێ کە خودای گەورە کە موحەمەدی(ﷺ) نارد کە دواین پێغەمبەرەو ڕەوانە کراوە بە گشتی بۆ نەوەی ئادەم، پێویستە بڕوای پێبێنن و لەهەر شتێکا فەرمانیان پێدەکا گوێ ڕایەڵی بن و هەرشتێکیشی لێقەدەغە کردوون لێی دورکەونەوە، ئەوانەی کە بەرفەرمانن خاوەنباوەڕی ڕاستە قینەن، ئومەتی موحەمەد(ﷺ)ناونراوە بە خاوەنباوەڕان، لەبەر زۆری بڕوایان و زۆر پابەند بوونیان، چونکە ئەوان بڕوایان بە هەموو پێغەمبەرانی پێشینە و ئەو شتە نادیارانەش لەمە بە دوا دێن هەیە.

### سابیئۆن-الصائبون-

بەڵام سابیئەکان، ڕای جیاوازیان هەیە لەسەریان، سوفیانی سەوری ئەڵێت: لە لەیس کوڕی ئەبوو سەلیمەوە، لە موجاهیدەوە ئەڵێت: گەلێکن لە نێوان مەجوس و جوولەکە و فەلەکاندا و هیچ ئاینێکیان نیە[3]. ئیبنو جورەیجیش هەروا ڕیوایەتی کردووە لێیەوە[1]. ڕیوایەتیش کراوە لە عەتا و سەعیدی کوڕی

---

[1] ال عمران ٥٢.

[2] الرازی /٣/٩٧ ص٦٧.

[3] الطبری /٢/١٤٢.

جوبەیر هەر بەو جۆرە . وە وتراوە: دەستەیەکن لە ئەهلی کتێب زەبور دەخوێننەوە. وە وتراوە: کۆمەڵێکن کە فریشتەکان دەپەرستن. وە وتراوە: کۆمەڵێکن ئەستێرەکان دەپەرستن. بەڵام دیارترین قسە قسەی موجاهید و ئەوانەن هاوڕای ئەون و وەهەبی کوڕی مونەببیهە کە دەڵێت: سابیئە کۆمەڵێکن نە لەسەری ئاینی جوولەکە و نە لەسەر ئاینی فەلە و نە لەسەر ئاینی مەجوسیەت و نە بت پەرستیشن. بەڵکو لەسەر سروشتی خۆیان ماونەتەوەو ئاینێکی تایبەتیان نیە لەسەری بن و شوێنی کەوتبن. هەر بۆیە بتپەرستەکان هەرکەسێ مسوڵمان ببوایە تانەیان لێئەدا و پێیان دەوت سابئی، واتە: لە ئاینەکانی سەردەمی ئەو خەڵکە دەرچووە و لایداوە. هەندێ لە زانایان دەڵێن: سابیئەکان: ئەوانەن کە بانگەوازی هیچ پێغەمبەرێکیان پێ نەگەیشتووە. و الله أعلم.

﴿ وَإِذْ أَخَذْنَا مِيثَٰقَكُمْ وَرَفَعْنَا فَوْقَكُمُ ٱلطُّورَ خُذُوا۟ مَآ ءَاتَيْنَٰكُم بِقُوَّةٍ وَٱذْكُرُوا۟ مَا فِيهِ لَعَلَّكُمْ تَتَّقُونَ ﴿٦٣﴾ ثُمَّ تَوَلَّيْتُم مِّنۢ بَعْدِ ذَٰلِكَ ۖ فَلَوْلَا فَضْلُ ٱللَّهِ عَلَيْكُمْ وَرَحْمَتُهُۥ لَكُنتُم مِّنَ ٱلْخَٰسِرِينَ ﴿٦٤﴾ ﴾

## پەیمان وەرگرتن لە جوولەکە لەگەڵ بەرزکردنەوەی کێوی تـوور بەسـەریانەوە پاشـان پـشتیان هەڵکردەوە

خودای گەورە ئەفەرموێت: ﴿ وَإِذْ أَخَذْنَا مِيثَٰقَكُمْ وَرَفَعْنَا فَوْقَكُمُ ٱلطُّورَ خُذُوا۟ مَآ ءَاتَيْنَٰكُم بِقُوَّةٍ وَٱذْكُرُوا۟ مَا فِيهِ لَعَلَّكُمْ تَتَّقُونَ ﴾ ئەوسایش کە ئێمە بەڵێنمان لێوەرگرتن و کێوی توورمان بەسەرتانە بەرز کردەوە، وتمان: هەرچی پێمان داون توون بیگرن، چی تێدایە لە بیری مەکەن، بەڵکو خۆ بپارێزن. خودای گەورە ئەو بەڵێن و پەیمانە دێنێتەوە بیر نەوەی ئیسرائیل کە تەنیا بڕوایان بە خودا هەبێ کە شەریکی نیە و شوێن پێغەمبەرانی کەون، هەواڵیشی داوە کاتێ بەڵێنی لێوەرگرتوون، ئەو کێوەیشی بەرز کردوەتەوە بەسەریانەوە، بۆ ئەوەی دان بنێن بەو بەڵێنەی کە داویانە، زۆر بەتوندێ و هێزو تواناوە پابەند بن پێیەوە. وەك خودای گەورە ئەفەرموێت: ﴿وَإِذْ نَتَقْنَا ٱلْجَبَلَ فَوْقَهُمْ كَأَنَّهُۥ ظُلَّةٌ وَظَنُّوٓا۟ أَنَّهُۥ وَاقِعٌۢ بِهِمْ خُذُوا۟ مَآ ءَاتَيْنَٰكُم بِقُوَّةٍ وَٱذْكُرُوا۟ مَا فِيهِ لَعَلَّكُمْ تَتَّقُونَ ﴾[3] ئەوکاتە کە کێوەکەمان وێنەی هەورێ بەسەریاندا بەرز کردەوە. لایان وابوو هەر بەسەریاندا دەکەوێ وتمان: ئەوەی داومانە پێتان تووند بیگرن، چی تێدایە لە بیرتان بێ، بەڵکو خۆتان بپارێزن. ئەو کێوە کێوی توور بووە. وەك لە سوورەتی ئەعرافدا تەفسیری کردووە. ئیبنو عەباس و موجاهید و عەتا و عیکرەمە و حەسەن و زەححاك و

[1] الطبری /٢/١٤٦.

[2] ابن ابی حاتم/١/١٩٩.

[3] الاعراف ١٧١.

ڕەبیعی کوڕی ئەنەس و کەسانی تریش وایان وتووە[1]. ئەوەیش دیارو ئاشکرایە. وە لە ڕیوایەتێکدا لە ئیبنو عەباسەوە هاتووە: توور ئەو کێوایە ڕووەکی تیایە، ئەوەی ڕووەکی تیا نیە تورر نیە[2]. حەسەن لەم دەقەدا کەخودای گەورە دەفەرموێت: ﴿خُذُواْ مَآ ءَاتَيْنَٰكُم بِقُوَّةٍ﴾ هەچی پێمان داون توووند بیگرن، ئەڵێت: مەبەست پێی تەوراتە[3]. موجاهید ئەڵێت: ﴿بِقُوَّةٍ﴾ یانی: کارکردن بەوەی تیایەتی[4]. ئەبولعالیە و ڕەبیع ئەڵێن: ﴿وَٱذْكُرُواْ مَا فِيهِ﴾ ئەفەرموێت: ئەوەی لە ناو تەوراتایە بیخوێننەوەو کاری پێبکەن[5].

پاشان خودای گەورە ئەفەرموێت: ﴿ثُمَّ تَوَلَّيْتُم مِّنۢ بَعْدِ ذَٰلِكَ فَلَوْلَا فَضْلُ ٱللَّهِ﴾ لەپاش ئەوە پشتان تێکرد ئەگەر چاکە و بەزەیی خودا بە هاناتان نەهاتایە. واتە: دوای ئەو بەڵێنە گەورەیە کە خودا لێی وەرگرتن پەشیمان بوونەوەو بەڵێنەکەتان شکاند. ﴿فَلَوْلَا فَضْلُ ٱللَّهِ عَلَيْكُمْ وَرَحْمَتُهُۥ﴾ ئەگەر بەزەیی خودا نەبوایە کە تەوبەی لێوەرگرتن و پێغەمبەرانی بۆ ڕەوانە کردن: ﴿لَكُنتُم مِّنَ ٱلْخَٰسِرِينَ﴾ئێوە لە زیان باران بوون بە هۆی شکاندنی ئەو بەڵێن و پەیمانەوە لە دونیا و لە قیامەتدا.

﴿وَلَقَدْ عَلِمْتُمُ ٱلَّذِينَ ٱعْتَدَوْاْ مِنكُمْ فِى ٱلسَّبْتِ فَقُلْنَا لَهُمْ كُونُواْ قِرَدَةً خَٰسِـِٔينَ ﴿٦٥﴾ فَجَعَلْنَٰهَا نَكَٰلًا لِّمَا بَيْنَ يَدَيْهَا وَمَا خَلْفَهَا وَمَوْعِظَةً لِّلْمُتَّقِينَ ﴿٦٦﴾﴾

### دەستدرێژیان لە ڕۆژی شەمەدا و گۆڕینی وێنەیان بە مەیمون و بەراز

خودای گەورە ئەفەرموێت: ﴿وَلَقَدْ عَلِمْتُمُ ٱلَّذِينَ ٱعْتَدَوْاْ مِنكُمْ فِى ٱلسَّبْتِ﴾ لە حاڵی ئەو کەسانەشتان ئاگاداربوون، کەوا لە ڕۆژی شەمەدا لە خۆتان دەست درێژیان کرد. واتە: ئەی کۆمەڵی جوولەکە خۆتان زانیوتانە چی بەسەر خەڵکی ئەو شارە هات کە سەرپێچی فەرمانی خودایان کرد و بەڵێن و پەیمانەکەیان شکاند کە لێی وەرگرتبوون کە ڕێزی ڕۆژی شەمە بگرن و فەرمانی خودا بەجێ بێن، لە پێشا بۆیان دروست بوو. فێڵیان بەکار هێنا بۆ ڕاوکردنی ماسی لە ڕۆژی شەمەدا، کاتێ کە بەو کارە هەڵسان،خودا شێوەی گۆڕینە سەر شێوەی مەیموون،کە شێوەیان دەچێتە سەر شێوەی مرۆڤ لە بیچمی دەرەوەیان، بە هیچ جۆرێ لە مرۆڤی ڕاستە قینە ناچن. هەر بەو جۆرەیش هەڵسوکەوتی ئەوانە و فێڵبازیان لەڕوی دەرەوە لە هەق دەچوو. کەچی لە ڕاستی و لە ڕوی ناوەوە پێچەوانەی هەق بوو.

---

[1] ابن ابی حاتم /١/٢٠٣ ص٦٧.

[2] ابن ابی حاتم /١/٢٠٣ ص٦٨.

[3] ابن ابی حاتم /١/٢٠٤.

[4] ابن ابی حاتم /١/٢٠٥.

[5] ابن ابی حاتم /١/٢٠٥.

بۆیە سزاکەشیان لە شێوەی کارەکانیانە. ئەم بەسەرهاتە لە سوورەتی ئەعرافدا بە ڕوونی باسکراوە. خودای گەورە ئەفەرموێت: ﴿وَسْـَٔلْهُمْ عَنِ ٱلْقَرْيَةِ ٱلَّتِى كَانَتْ حَاضِرَةَ ٱلْبَحْرِ إِذْ يَعْدُونَ فِى ٱلسَّبْتِ إِذْ تَأْتِيهِمْ حِيتَانُهُمْ يَوْمَ سَبْتِهِمْ شُرَّعًا وَيَوْمَ لَا يَسْبِتُونَ ۙ لَا تَأْتِيهِمْ ۚ كَذَٰلِكَ نَبْلُوهُم بِمَا كَانُوا۟ يَفْسُقُونَ﴾[1] دەربارەی ئەو شارەی وا کەوتبوە کەناری دەریا لێیان بپرسە، کە بەشەممە نافەرمانی خوایان کرد. چونکە لە ڕۆژی شەممەدا ماسیەکان سەر ئاو دەکەوتن و ڕۆژی شەممە نەبوایە دیاریان نەبوو. ئەو کەسانەی لە ڕێی خودا لا ئەدەن، ئێمە ئاوا تاقییان دەکەینەوە. عەوفی لە تەفسیرەکەیدا لە ئیبنو عەباسەوە ئەڵێت: ﴿فَقُلْنَا لَهُمْ كُونُوا۟ قِرَدَةً خَـٰسِـِٔينَ﴾ پێمان وتن: مەیمونی ترۆکراو بن. خودا هەنێ لەوانەی کردە مەیمون و بەراز. وە دەڵێ: گەنجەکانی ئەو کۆمەڵە بوون بە مەیمون و بەساڵا چوەکانیشیان بوون بە بەراز[2]. شەیبانی نەحوی لە قەتادەوە ئەڵێت: ﴿فَقُلْنَا لَهُمْ كُونُوا۟ قِرَدَةً خَـٰسِـِٔينَ﴾ ئەو کۆمەڵە بوونە مەیمون و دەیان لوراند و کلکیشیان لێدەرهات دوای ئەوەی کە پیاو ژن بوون[3].

## ئەم مەیمون و بەرازەی ئێستا لە وەچەی ئەوانە نین کە شێوەیان گۆڕاوە

ئیبنو ئەبی حاتەم ڕیوایەتی کردوە لە ئیبنو عەباسەوە ئەڵێت: بێگومان ئەوانەی دەستدێژیەکەیان کرد لە شەممەدا ماوەیەکی کەم بوونە مەیمون و پاشان لەناو چوون. هیچ کەسێ لەوانە کە بوونە مەیمون و بەراز وەچەیان نەما[4]. زەحاك لە ئیبنو عەباسەوەئەڵێت: خودا شێوەی گۆڕین و کردنیە مەیمون بە هۆی سەرپێچیەکەیانەوەو دەڵێت: جگە لە سێ ڕۆژ بە زیندویی نەماونەتەوە لەسەر زەمینا، وتی: هەرگیز ئەوانەی کەشێوەیان گۆڕاوە سێ ڕۆژ زیاتر نەماونەتەوە. نە خواردن و نە خواردنەوەو نە وەچەشیان بوو. خودای گەورە مەیمون و بەرازو گشت دروستکراوەکانی تریشی لە شەش ڕۆژدا دروست کردووە، وە خودای گەورە لە کتێبەکەیدا باسی کردووە. خودای گەورە شێوەی ئەو کۆمەڵەی گۆڕیوە ویستی خۆیەتی هەرچی بوێت بەهەر کەسێ دەیکا و مەیلی خۆیەتی چۆنیشی دەگۆڕێ[5].

پاشان خودای گەورە ئەفەرموێت: ﴿فَجَعَلْنَـٰهَا نَكَـٰلًا﴾ بە پەندێکی وامان بردن هاوچەخان و دوای

---

[1] الاعراف ١٦٣.

[2] ابن ابی حاتم /١/٢١٠ ص٦٨.

[3] ابن ابی حاتم /١/٢٠٩.

[4] ابن ابی حاتم /١/٢٠٩.

[5] الطبری /٢/١٦٧.

ئەوانیش چاو ترسێن بکا. واتە: خودای گەورەئەو شارەی واتە: خەڵکەکەی بە هۆی ئەو دەست درێژیانە لە شەممەکەیاندا کردیان تۆڵەیەکی وای لێکردنەوە، کردنیە پەندی زەمانەوەك خودای گەورە دەربارەی فیرعەون ئەفەرموێت: ﴿فَأَخَذَهُ ٱللَّهُ نَكَالَ ٱلْءَاخِرَةِ وَٱلْأُولَىٰٓ﴾[1] ئەوسا خودا گیرۆدەی ئازاری قیامەت و دنیاشی کرد. وە ئەفەرموێت: ﴿لِّمَا بَيْنَ يَدَيْهَا وَمَا خَلْفَهَا﴾ بۆ خەڵکی ئەو سەردەمە و ئەوانەی دوایش لەو شارانە. ئیبنو عەباس ئەڵێت: واتە: بەوەی کە بەسەرمان هێنان لەو سزایە تا ببێتە پەند بۆ دەورو بەری خۆیان لە شارانە. وەك خودای گەورە ئەفەرموێت: ﴿وَلَقَدْ أَهْلَكْنَا مَا حَوْلَكُم مِّنَ ٱلْقُرَىٰ وَصَرَّفْنَا ٱلْءَايَـٰتِ لَعَلَّهُمْ يَرْجِعُونَ﴾[2] زۆر لەو شارانەمان قڕ تێ خستوون کە هەر لەدەوری ئێوە بوون، هەموو جۆرە نیشانەیەکمان نیشان دان، بەڵکو بگەڕێنەوە. واتە: ئەوانەمان کردە پەند بۆ خەڵکی چەخی خۆیان و ئامۆژگاریش بێ بۆ ئەوانەی دوایی دێن. بە هەواڵی موتەواتیر دەربارەیان. هەر بۆیە خودای گەورە ئەفەرموێت: ﴿وَمَوْعِظَةً لِّلْمُتَّقِينَ﴾ دەرسێکیش بێ بۆ پارێزکاران. مەبەست پێی لێرەدا پەندو ئامۆژگاریە. واتە: ئەوەی بەسەر ئەوانەمان هێنا لەو تۆڵە و سزایە لەسەر ئەو خراپە و سەرپێچیان بوو کە کردیان و سنورەکانی خودایان بەزاند و دەستیان دایە فێڵبازی. کەواتە با خۆپارێزانیش ئاگایان لە خۆیان بێ و خۆیان دوور بگرن لەو کارانەی ئەوان تا ئەوەی تووشی ئەوانە هات، بەسەر ئەوانیش نەیەت. وەك ئیمام ئەبو عەبدڵڵای کوڕی بەتتە ڕیوایەتی کردووە لە ئەبو هورەیرەوە کە پێغەمبەری خودا (ﷺ) فەرمویەتی: کارێ مەکەن کە جوولەکەکان کردویانە قەدەغەکراوەکانی خودا حەلاڵ بکەن بە سوکە فێڵێ[3]. ئەم فەرمودە سەنەدەکەی چاکە و الله أعلم.

﴿وَإِذْ قَالَ مُوسَىٰ لِقَوْمِهِۦٓ إِنَّ ٱللَّهَ يَأْمُرُكُمْ أَن تَذْبَحُوا۟ بَقَرَةً ۖ قَالُوٓا۟ أَتَتَّخِذُنَا هُزُوًا ۖ قَالَ أَعُوذُ بِٱللَّهِ أَنْ أَكُونَ مِنَ ٱلْجَـٰهِلِينَ ﴿٦٧﴾﴾

**بەسەرهاتی کوژراوەکەی نەوەی ئیسرائیل و مانگاکە ( چێڵەکە )**

خودای گەورە ئەفەرموێت: ﴿وَإِذْ قَالَ مُوسَىٰ لِقَوْمِهِۦٓ إِنَّ ٱللَّهَ يَأْمُرُكُمْ أَن تَذْبَحُوا۟ بَقَرَةً ۖ قَالُوٓا۟ أَتَتَّخِذُنَا هُزُوًا ۖ قَالَ أَعُوذُ بِٱللَّهِ أَنْ أَكُونَ مِنَ ٱلْجَـٰهِلِينَ﴾ بیر لەو کاتەش بکەنەوە کە موسا بە هۆزەکەی وت: خودا فەرمانتان پێدەکا کەئێوە مانگایەك سەربڕن. وتیان: ئایەدەتەوێ گاڵتەمان پێبکەی؟ وتی: پەنا دەگرم

---

[1] النازعات ٢٥.

[2] الاحقاق ٢٧.

[3] إرواء الغيل/٥/٣٧٥/سه نه ده كانى حه سه نه ص٦٨.

بە خودا لە ڕیزی نەزانان بم. خودای گەورە ئەفەرموێ ئەی نەوەی ئیسرائیل بەهرەکانی من وە بیر خۆتان بێننەوە. لەبارەی ئەو موعجیزەوە دەربارەی مانگاکە و ئاشکرا کردنی پیاوکوژەکە و کێ هۆکاری کوشتنەکە بووە و زیندوکردنەوەی کوژراوەکە و قسەکردنی دەربارەی ئەو کەسەی کوشتویەتی لەوان. پیاوێك لە نەوەی ئیسرائیل وەجاخی کوێر بوو، منداڵی نەدەبوو، ماڵو سامانێکی زۆری هەبوو، برازایەکی میراتگری بوو. کوشتی و بەشەو هەڵی گرت و لەبەر دەرگای ماڵێکی ترا لە نەوەی ئیسرائیل دای نا, پاشان بەیانی لەسەر کوشتنەکەی کردیە هەرا هەتاوای لێهات دەستیان دایە چەك خەریك بوو پەلاماری یەکتری بدەن. پیاوێکی ژیرو بە ئاوەزیان وتی: بۆچی خەریکن یەکتری بکوژن. ئەوە پێغەمبەرێکی خودایە لەناوتاندا؟ هاتن بۆلای موسا سەلامی خوای لێبێ باسەکەیان بۆ گێڕایەوە وتی: ﴿إِنَّ ٱللَّهَ يَأۡمُرُكُمۡ أَن تَذۡبَحُواْ بَقَرَةٗۖ قَالُوٓاْ أَتَتَّخِذُنَا هُزُوٗاۖ قَالَ أَعُوذُ بِٱللَّهِ أَنۡ أَكُونَ مِنَ ٱلۡجَٰهِلِينَ﴾ خودا فەرمانتان پێدەکا کە ئێوە مانگایەك سەربڕن. وتیان: ئایە دەتەوێ گاڵتەمان پێبکەی؟ وتی: پەنا دەبەم بە خودا کە لە ڕیزی نەزانان بم. خۆ ئەگەر بیانویان نەگرتایە هەر مانگایەکیان سەربڕیایە دەبوو با زۆر چاکیش نەبوایە. بەڵام کارەکەیان زۆر بە توند گرت. خودایش توندی کردەوە لەسەریان تا گەیشتە ئەو مانگایە کە فەرمانیان پێدرا سەری بڕن. لەلای پیاوێ ئەو مانگایە دەست کەوت تانیا ئەو مانگای هەبوو، وتی: سوێند بە خودا بە پڕی پێستەکەی ئاڵتوون نەبێ نایدەم و هیچی لێکەم ناکەم. بە پڕی پێستەکەی زێڕمانگاکەیان برد. سەریان بڕی هەندێ لە گۆشتی مانگاکەیان دا لە کوژراوەکە، کوژراوەکە هەڵسا، وتیان: کێ کوشتویتی؟ وتی: ئەمە بە برازاکەی خۆی پاشان لاربوەوە بە مردوویی، لە ماڵی ئەو مەردمە هیچی نەبرد، دوای ئەوە هیچ پیاوکوژێ میراتی نەدەبرد[1]. ئیبنو جەریریش هەر بەو جۆرە ڕیوایەتی کردووە و الله أعلم[2].

﴿ قَالُواْ ٱدۡعُ لَنَا رَبَّكَ يُبَيِّن لَّنَا مَا هِيَۚ قَالَ إِنَّهُۥ يَقُولُ إِنَّهَا بَقَرَةٞ لَّا فَارِضٞ وَلَا بِكۡرٌ عَوَانُۢ بَيۡنَ ذَٰلِكَۖ فَٱفۡعَلُواْ مَا تُؤۡمَرُونَ ﴿٦٨﴾ قَالُواْ ٱدۡعُ لَنَا رَبَّكَ يُبَيِّن لَّنَا مَا لَوۡنُهَاۚ قَالَ إِنَّهُۥ يَقُولُ إِنَّهَا بَقَرَةٞ صَفۡرَآءُ فَاقِعٞ لَّوۡنُهَا تَسُرُّ ٱلنَّٰظِرِينَ ﴿٦٩﴾ قَالُواْ ٱدۡعُ لَنَا رَبَّكَ يُبَيِّن لَّنَا مَا هِيَ إِنَّ ٱلۡبَقَرَ تَشَٰبَهَ عَلَيۡنَا وَإِنَّآ إِن شَآءَ ٱللَّهُ لَمُهۡتَدُونَ ﴿٧٠﴾ قَالَ إِنَّهُۥ يَقُولُ إِنَّهَا بَقَرَةٞ لَّا ذَلُولٞ تُثِيرُ ٱلۡأَرۡضَ وَلَا تَسۡقِي ٱلۡحَرۡثَ مُسَلَّمَةٞ لَّا شِيَةَ فِيهَاۚ قَالُواْ ٱلۡـَٰٔنَ جِئۡتَ بِٱلۡحَقِّۚ فَذَبَحُوهَا وَمَا كَادُواْ يَفۡعَلُونَ ﴿٧١﴾ ﴾

---

[1] ابن ابی حاتم /١/١١٤ ص٦٩.

[2] الطبری /٢/١٨٣.

## گێری و زۆر لەسەر چوونیان دەربارەی مانگاکە و خودایش زیاتر لەسەری توند کردن

خودای گەورە باسی گێری و خراپی نەوەی ئیسرائل و زۆر پرسیاکردنیان دەکا لە پێغەمبەرەکانیان، بۆیە کاتێ کە گیرو گرفتیان بۆ خۆیان دروست دەکرد خودایش زیاتر لەسەری توند دەکردن، خۆ ئەگەر هەر مانگایەکیان سەربڕیایە کێشەکەی چارەسەر دەکردن. وەکو ئیبنو عەباس و عوبەیدە و کەسانی تریش وتویانە. بەڵام کە لەسەر خۆیان گران کرد، خودایش زیاتر گرانی کرد لەسەریان: ﴿ٱدۡعُ لَنَا رَبَّكَ يُبَيِّن لَّنَا مَا هِيَۚ﴾ وتیان: لە پەروەردگاری خۆت پرسیار بکە چۆن مانگایەکە؟ شێوەی چۆنە؟﴿إِنَّهُۥ يَقُولُ إِنَّهَا بَقَرَةٞ لَّا فَارِضٞ وَلَا بِكۡرٌ﴾ وتی: دەڵێ ئەو چێڵەیە کە نەپیری پەککەوتەیە و نە کەم تەمەن. واتە: زۆر گەورەو بەساڵا چوو نیە و ئەوندەش بچوك نیە کەڵەگا بۆی نەچوبێ؟ وەك ئەبولعالیە و سوددی و موجاهید وعیکرەمە و عەتیەی عەوفی و عەتای خۆراسانی و وەهەبی کوڕی مونەبە زەححاك و حەسەن و قەتادە وتویانە. ئیبنو عەباسیش هەروای وتووە[1]. زەححاك لە ئیبنو عەباسەوەئەڵێت: ﴿عَوَانُۢ بَيۡنَ ذَٰلِكَ﴾ ناوەنجیە. واتە: مام ناوەندیە لە نێوان گەورەیی و بچوکیدا کە بە توانا ترو بەهێز ترە لە وڵاخ و مانگاکانی ترو چاکتریشە[2]. ﴿فَٱفۡعَلُواْ مَا تُؤۡمَرُونَ﴾ بە چی فەرمانتان پێدراوە دەبێ بیکەن: ﴿قَالُواْ ٱدۡعُ لَنَا رَبَّكَ يُبَيِّن لَّنَا مَا لَوۡنُهَاۚ قَالَ إِنَّهُۥ يَقُولُ إِنَّهَا بَقَرَةٞ صَفۡرَآءُ فَاقِعٞ لَّوۡنُهَا تَسُرُّ ٱلنَّٰظِرِينَ﴾ وتیان: لە پەروەردگاری خۆت بپرسە پێمان بڵێ چ ڕەنگێکە؟ وتی: ئەفەرموێت: زەردی تێرە دڵی تەماشاکەران خۆش دەکا. عەوفی لە تەفسیرەکەیدا لە ئیبنو عەباسەوە ئەڵێت: ﴿فَاقِعٞ لَّوۡنُهَا﴾ زۆر زەردە. ئەوەندەزەردە مەیلەوسپی دەنوێنێ[3] سوددی ئەڵێت: ﴿تَسُرُّ ٱلنَّٰظِرِينَ﴾ تەماشاکەرانی سەرنج ڕادەکێشێ[4]. ئەبولعالیە و قەتادە و ڕەبیعی کوڕی ئەنەسیش هەر وایان وتووە[5]. وەهبی کوڕی مونەبە ئەڵێت: کاتێ سەیری پێستەکەیت کرد وا دەزانی تیشکی خۆر لە پێستەکەیەوە دەردەچێت[6]. وە لەتەوراتیشا هاتووە: ئەو مانگایە سوور بووە لەوانەیە ئەوە هەڵەیك بێ لە کردنی بە عەرەبی، یان وەك یەکەم وتی: ئەوندە زەرد بووە سور ڕەنگیشی

---

[1] ابن ابی حاتم /٢١٦/١ ص٦٩.

[2] ابن ابی حاتم /٢١٧/١.

[3] ابن ابی حاتم /٢٢١/١.

[4] ابن ابی حاتم /٢٢٢/١.

[5] ابن ابی حاتم /٢٢٢/١.

[6] الطبری /٢٠٢/٢.

نواندووە و الله أعلم. خودای گەورەئەفەرموێت: ﴿قَالُوا ادْعُ لَنَا رَبَّكَ يُبَيِّن لَّنَا مَا هِيَ إِنَّ الْبَقَرَ تَشَابَهَ عَلَيْنَا﴾ وتیان: دیسان لە پەروەردگارت بپرسە با پیمان بلێ چۆن چۆنیە؟ مانگا سەری لێ تێکداوین. لەبەر زۆریان بەباشی بۆمان جیا بکاتەوە و وەسفی بکا بۆمان: ﴿وَإِنَّا إِن شَاءَ اللَّهُ لَمُهْتَدُونَ﴾ ئەگەر خودا خۆی حەز بکات دەتوانین شارەزا بین: ﴿قَالَ إِنَّهُ يَقُولُ إِنَّهَا بَقَرَةٌ لَّا ذَلُولٌ تُثِيرُ الْأَرْضَ وَلَا تَسْقِي الْحَرْثَ﴾ وتی: ئەفەرموێت: نە مانگایەکی ڕاهێنراوە جووت بکا نە ئاویش دەکێشێ بۆ زەوی. واتە: فێر نەکراوە جووت بکا، نە ئامادەیش کراوە ئاو بکێشێ. بەڵکو بە چاکی مێڵراوەتەوە. عەبدالڕەزاق لە موعەمەرەوە لە قەتادەوە ئەڵێت: ﴿مُسَلَّمَةٌ﴾ هیچ پەڵەشی تێدا نیە. وتی: هیچ کەم و کوڕیەکی تێدا نیە[1]. ئەبولعالیە وڕەبیعیش هەروایان وتووە. موجاهید ئەڵێت: یەك ڕەنگە و پەڵەی تێدا نیە[2]. عەتای خۆراسانی ئەڵێت: چوار پەل و لاشەی ساغە وە هیچ پەڵەشی تێدا نیە[3]. ﴿فَذَبَحُوهَا وَمَا كَادُوا يَفْعَلُونَ﴾ ئەوسا سەریان بڕی وەختیش بوو ئەم کارە نەکەن. زەححاك لە ئیبنو عەباسەوە ئەڵێت: خەریك بوو ئەو کارە نەکەن، چونکە ئەوان مەبەستیان ئەوە نەبوو، ئەوان دەیان ویست کە سەری نەبڕن[4]. واتە: ئەوان لەگەڵ ئەو هەموو ڕونکردنەوەو پرسیارو وەڵامەدا هەر سەریان نەدەبڕشی تا دوای هەوڵێکی زۆر. ئەمە خۆی زەم کردنیانە چونکە ئەوانە تەنیا مەبەستیان سەرپێچی و لاساری بوو. هەر بۆیە خەریکی ئەوە بوون کە سەری نەبڕن. عوبەیدە و موجاهید و وەهبی کوڕی مونەبە و ئەبو لعالیە و عەبدلڕەحمانی کوڕی زەیدی کوڕی ئەسلەم ئەڵێن: ئەوانە بە ماڵو سامانێکی زۆر کڕیبویان، ڕای جیاواز لەسەری هەیە[5].

﴿وَإِذْ قَتَلْتُمْ نَفْسًا فَادَّارَأْتُمْ فِيهَا وَاللَّهُ مُخْرِجٌ مَّا كُنتُمْ تَكْتُمُونَ ﴿٧٢﴾ فَقُلْنَا اضْرِبُوهُ بِبَعْضِهَا كَذَلِكَ يُحْيِي اللَّهُ الْمَوْتَى وَيُرِيكُمْ آيَاتِهِ لَعَلَّكُمْ تَعْقِلُونَ ﴿٧٣﴾﴾

**زیندوبونەوەی کوژراوو دیاری کردنی پیاو کوژەکە**

خودای گەورە ئەفەرموێت: ﴿وَإِذْ قَتَلْتُمْ نَفْسًا فَادَّارَأْتُمْ فِيهَا وَاللَّهُ مُخْرِجٌ مَّا كُنتُمْ تَكْتُمُونَ﴾ ئەوسا یەکێکتان کوشت لەسەر کوژراوەکە یەکترتان تاوان بار دەکرد. کە خودا بۆی دەرخستن ئەوەی دەتان

---

[1] الطبری /٢/٢١٤.
[2] ابن ابی حاتم /١/٢٢٥.
[3] ابن ابی حاتم /١/٢٢٦.
[4] الطبری /٢/١١٩ ص٦٩.
[5] الطبری /٢/٢٢١ ص٧٠.

شاردەوە. ﴿فَادَّارَءۡتُمۡ﴾ واتە: لەناو خۆتاندا ناكۆك بوون لەسەری[1]. موجاهیدیش هەروای وتووە، عەتای خۆراسانی و زەححاك ئەڵێن: كێشەتان بوو لەسەری[2]. ئیبنو جورەیج ئەڵێت: ﴿وَإِذۡ قَتَلۡتُمۡ نَفۡسٗا فَادَّارَءۡتُمۡ فِيهَا﴾ ئەوكاتە كەسێكتان كوشت لەسەر كوژراوەكە یەكترتان تاوان بار دەكرد. هەندێ دەڵێن: ئێوە كوشتان. هەندێكی تر وتویانە: بێگومان ئێوە خۆتان كوشتوتانە[3]. عەبدولڕەحمانی كوڕی زەیدی كوڕی ئەسلەم ئەڵێت: ئێوە خۆتان كوشتوتانە ﴿وَٱللَّهُ مُخۡرِجٞ مَّا كُنتُمۡ تَكۡتُمُونَ﴾[4] ئەوەی كە دەتان شاردەوە خودا ئاشكرای كرد. موجاهید وتی: ﴿مَّا كُنتُمۡ تَكۡتُمُونَ﴾ ئەوەی دەتان شاردەوە[5]. خودای گەورە ئەفەرموێت: ﴿فَقُلۡنَا ٱضۡرِبُوهُ بِبَعۡضِهَا﴾ پارچەیەك لە لاشەی مانگاكە لە كوژراوەكە بدەن. ئەو پارچە، هەرشتێ بێ لەلاشەی مانگاكە، موعجیزەكە دێتە دی و ڕوئەدات، خۆ ئەگەر دیاریش بكرایە، ئەگەر لە دیاری كردنیدا سودێكی ببویایە بۆ دنیا و بۆ قیامەتمان بێگومان خودا بۆی دیاری دەكردین، بەڵام كە دیاری نەكردووە و لە هیچ ڕێگەیەكی ڕاستەوە نەهاتووە لەلایەن پێغەمبەرانەوە باسیان كردبێ، ئێمە هەر بەو شێوەیە دەیهێڵینەوە وەك خودای گەورەچۆن بە دیاری نەكراوی هێشتویەتیەوە. پاشان خودای گەورە ئەفەرموێت: ﴿كَذَٰلِكَ يُحۡيِ ٱللَّهُ ٱلۡمَوۡتَىٰ﴾ خودا ئاوا مردوو زیندو دەكاتەوە واتە: لەپارچەی مانگاكەیان لێداو زیندوو بوەوە. خودای گەورە وشیاری ئەدات لەسەر تواناو دەسەڵاتی خۆیی و زیندوكردنەوەی مردوەكە و پیشاندانیان بەوەی كە كێ كوشتویەتی، خودای گەورە كردیە بەڵگە لەسەر زیندو بوونەوە لە ڕۆژی قیامەتا و ئەو كێشەو لاساریەی ئەوانەش دەربخات و كۆتایی پێبهێنێ. خودای گەورەلەم سورەتەدا باسی لەوانە كردووە كە وەدی هێناوە لە زیندو كردنەوەی مردوو لە پێنج شوێندا: ﴿ثُمَّ بَعَثۡنَٰكُم مِّنۢ بَعۡدِ مَوۡتِكُمۡ﴾[6] لەپاش ئەوەی كە مردبوون سەرلەنوێ زیندومان كردنەوە. ئەم بەسەرهاتەو بەسەرهاتی ئەو كەسەی بەلای شارەكەدا تێپەڕی خانوەكانیان بەسەر یەكدا ڕوخابوو. وە بەسەرهاتەكەی ئیبراهیم سەلامی خوای لێبێ چوار باڵندەكە. وە خودای گەورە ئاگاداری داوە بە زیندو كردنەوەی زەوی دوای مردنی لەسەر زیندو كردنەوەی لاشەكان دوای ڕزان و پوكانەوەیان. بەڵگەش

---

[1] فتح الباری /٦/٥٠٦.

[2] ابن ابی حاتم /١/٢٢٩.

[3] الطبری /٢/٢٢٥.

[4] الطبری /٢/٢٢٥.

[5] ابن ابی حاتم /١/٢٢٩.

[6] البقرة ٥٦.

لەسەر ئەمە ئەم ئایەتەیە کە خودای گەورە ئەفەرموێت: ﴿ وَءَايَةٌ لَّهُمُ ٱلْأَرْضُ ٱلْمَيْتَةُ أَحْيَيْنَٰهَا وَأَخْرَجْنَا مِنْهَا حَبًّا فَمِنْهُ يَأْكُلُونَ ﴿٣٣﴾ وَجَعَلْنَا فِيهَا جَنَّٰتٍ مِّن نَّخِيلٍ وَأَعْنَٰبٍ وَفَجَّرْنَا فِيهَا مِنَ ٱلْعُيُونِ ﴿٣٤﴾ لِيَأْكُلُوا۟ مِن ثَمَرِهِۦ وَمَا عَمِلَتْهُ أَيْدِيهِمْ ۖ أَفَلَا يَشْكُرُونَ ﴾[1] هەرلەزەویش رابمێنن، نیشانەی بۆ ئەوان تێدایە، بە مردوویی ئێمە زیندومان کردەوە، دانەوێڵەمان لێ بەرهەم هێنا کە خۆراکە بۆ ئەمانە، هەر لە زەویش چەندین باغی بنە خورما و ڕەزی زۆرمان وەدی هێنا و چەند کانیاومان لێهەڵقولاند، تا لە میوەی خودا و لە دەسڕەنجی خۆیان بخۆن، ئایە هێشتا شکور ناکەن؟

﴿ ثُمَّ قَسَتْ قُلُوبُكُم مِّنۢ بَعْدِ ذَٰلِكَ فَهِىَ كَٱلْحِجَارَةِ أَوْ أَشَدُّ قَسْوَةً ۚ وَإِنَّ مِنَ ٱلْحِجَارَةِ لَمَا يَتَفَجَّرُ مِنْهُ ٱلْأَنْهَٰرُ ۚ وَإِنَّ مِنْهَا لَمَا يَشَّقَّقُ فَيَخْرُجُ مِنْهُ ٱلْمَآءُ ۚ وَإِنَّ مِنْهَا لَمَا يَهْبِطُ مِنْ خَشْيَةِ ٱللَّهِ ۗ وَمَا ٱللَّهُ بِغَٰفِلٍ عَمَّا تَعْمَلُونَ ﴿٧٤﴾ ﴾

**باسی دڵڕەقی جوولەکە**

خودای گەورە سەرزەنشتی نەوەی ئیسرائیل دەکا دوای ئەو هەموو نیشانەیە بە چاوی خۆیان دیان لە زیندو کردنەوەی مردوو ئەفەرموێت: ﴿ ثُمَّ قَسَتْ قُلُوبُكُم مِّنۢ بَعْدِ ذَٰلِكَ ﴾ لەپاش ئەمەش بوونە دڵڕەقێکی وەها لە چەشنی بەرد، بگرە ڕەقتریش بوو لە بەرد. لەو بەردانە کە نەرم نابنەوە هەرگیز. هەر بۆیە خودای گەورە. قەدەغەی کردووە لە خاوەنباوەڕان کە وەك ئەوانە بن و ئەفەرموێت: ﴿ أَلَمْ يَأْنِ لِلَّذِينَ ءَامَنُوٓا۟ أَن تَخْشَعَ قُلُوبُهُمْ لِذِكْرِ ٱللَّهِ وَمَا نَزَلَ مِنَ ٱلْحَقِّ وَلَا يَكُونُوا۟ كَٱلَّذِينَ أُوتُوا۟ ٱلْكِتَٰبَ مِن قَبْلُ فَطَالَ عَلَيْهِمُ ٱلْأَمَدُ فَقَسَتْ قُلُوبُهُمْ ۖ وَكَثِيرٌ مِّنْهُمْ فَٰسِقُونَ ﴾[2] بۆ کەسانی خاوەنباوەڕ ئایا ئەو کاتە نەهاتووە کە دڵیان بۆ یادی خودا و بۆ ئەو ڕاستیەی کە ناردویەتی دابچڵەکێ و بگورێ و بەدەردی ئەوانە نەچن کە لە پێشدا ئێمە کتێبمان دابونێ و ئەوسا لە پاش ماوەیەکی زۆر تووشی دڵڕەقی هاتن زۆربەیان لە ڕێ لایان دا؟ عەوفی لە تەفسیرەکەیدا لە ئیبنو عەباسەوە ئەڵێت: کاتێ کە هەندێ لە پارچەی مانگاکە درا لە لاشەی مردوەکە دانیشت وەك هەر زیندو بوبێ، پێی وترا: کێ تۆی کوشت؟ وتی: برازاکانم کوشتمیان. پاشان گیانی لێسەنرایەوەو مرد. برازاکانی دوای ئەوە کە خوا گیانی لێسەندەوە و مرد وتیان بە خوا ئێمە نەمان کوشتووە. بڕوایان بەو هەقە نەکرد کە بەچاوی خۆیان بینیان. خودای گەورەش فەرمووی: ﴿ ثُمَّ قَسَتْ قُلُوبُكُم مِّنۢ بَعْدِ ذَٰلِكَ ﴾ لەپاش ئەمەش دڵتان ڕەق بوو. واتە: برازاکانی ئەو پیاوە بەتەمەنە، ﴿ فَهِىَ

---

[1] یس ٣٣-٣٥.

[2] الحدید ١٦.

كَٱلْحِجَارَةِ أَوْ أَشَدُّ قَسْوَةً ﴾[1] لە چەشنی بەرد بگرە ڕەقتریش بوو لە بەرد. دڵی نەوەی ئیسرائیل دوای ماوەیەكی زۆر تەواو ڕەق بوو ئامۆژگاری كاری تێنەدەكردن دوای بینینی ئەو موعجیزانە وەك بەردی ڕەقی لێهات، چارەی نیە هەر ڕەقە، یان بگرە لە بەردیش ڕەقتر بوو، چونكە بەردی وا هەیە ئاوی لێ هەڵدەقوڵێ و كانی و ڕوباری لەبەر دەڕوات، بەردی واش هەیە هەر ئاوی لێدەردێت با لەبەری یشی نەڕوات. هی واش هەیە لە ترسی خودا لەسەر كێوەكانەوە دەكەوێتە خوارەوەو بە پێی خۆی هەستی هەیە. موحەمەدی كوڕی ئیسحاق ڕیوایەتی كردووە لە ئیبنو عەباسەوە: ﴿وَإِنَّ مِنَ ٱلْحِجَارَةِ لَمَا يَتَفَجَّرُ مِنْهُ ٱلْأَنْهَٰرُ ۚ وَإِنَّ مِنْهَا لَمَا يَشَّقَّقُ فَيَخْرُجُ مِنْهُ ٱلْمَآءُ ۚ وَإِنَّ مِنْهَا لَمَا يَهْبِطُ مِنْ خَشْيَةِ ٱللَّهِ﴾ چونكە تەختە بەردی وا هەن چەند جۆباری لەبەر دەڕوات، هەمیشە تڕەك تڕەك دەبێ و ئاوی لێوە دەردەچێت، هیواش هەیە لە ترسی خودا لە لوتكەی شاخەكان بەردەبێتەوە. واتە: بەردی وا هەیە لە دڵی ئێوە نەرم ترە. ﴿وَمَا ٱللَّهُ بِغَٰفِلٍ عَمَّا تَعْمَلُونَ﴾ لەهەر كارێ دەیكەن خودا ئاگادارە[2].

## بونی هێزی پەی پێبردن لە بێ گیاناندا

هەندێ لە زانایان وتویانە ئەمە لە بابی مەجازە كە ترس بدەیتە پاڵ بەرد، وەك چۆن ویست دراوەتە پاڵ دیوار. خودای گەورە ئەفەرموێت: ﴿يُرِيدُ أَن يَنقَضَّ﴾ خەریك بوو بەلادا دەهات. ڕازی و قورتوبی و كەسانی تریش لە ئیمامەكان وتویانە: هیچ پێویست بەوە ناكا، چونكە خودای گەورە ئەو سیفەتەی تیا دروست دەكا. وەك لەم ئایەتەدا ئەفەرموێت: ﴿ إِنَّا عَرَضْنَا ٱلْأَمَانَةَ عَلَى ٱلسَّمَٰوَٰتِ وَٱلْأَرْضِ وَٱلْجِبَالِ فَأَبَيْنَ أَن يَحْمِلْنَهَا وَأَشْفَقْنَ مِنْهَا ﴾[3] ئێمە ئەم ئەمانەتیەمان لە بەرانبەر ئاسمانەكان و زەمین و ئەو هەموو كێوانە ڕانا، هیچیان لە خۆیان ڕانەدی بچنە ژێری و لێی ترسان. وە ئەفەرموێت: ﴿تُسَبِّحُ لَهُ ٱلسَّمَٰوَٰتُ ٱلسَّبْعُ وَٱلْأَرْضُ وَمَن فِيهِنَّ ﴾[4] حەوت ئاسمانان و زەمین و هەچی لەناو ئەوانەدایە ستایشی خوا دەكەن. وە ئەفەرموێت: ﴿ وَٱلنَّجْمُ وَٱلشَّجَرُ يَسْجُدَانِ ﴾[5] گژو گیاو درەخت سوژدە دەبەن بۆ خودا. وە

---

[1] الطبری /٢/٢٣٤ ص٧٠.

[2] ابن ابی حاتم /١/٢٢٣.

[3] الاحزاب ٧٢.

[4] الاسراء ٤٤.

[5] الرحمن ٦.

ئەفەرمویت: ﴿أَوَلَمْ يَرَوْا إِلَىٰ مَا خَلَقَ ٱللَّهُ مِن شَيْءٍ يَتَفَيَّؤُا ظِلَٰلُهُۥ﴾[1] ئایا بە چاو نەیان دیووە، کە هەرچی خودا دروستی کردووە، سێبەریان بە ڕاست و چەپا بەمل کەچی سوژدە بەرەو خوا دەبەن؟ وە ئەفەرمویت: ﴿قَالَتَآ أَتَيْنَا طَآئِعِينَ﴾[2] وتیان: وا بەخۆشی هاتین. وە ئەفەرمویت: ﴿لَوْ أَنزَلْنَا هَٰذَا ٱلْقُرْءَانَ عَلَىٰ جَبَلٍ لَّرَأَيْتَهُۥ خَٰشِعًا مُّتَصَدِّعًا مِّنْ خَشْيَةِ ٱللَّهِ﴾[3] ئەگەر ئێمە ئەم قورئانەمان بناردایەتە سەر کەژێك، تۆ دەتدی کە داهاتووە و لەترسی خودا لەت لەت بووە. وە ئەفەرمویت: ﴿وَقَالُوا۟ لِجُلُودِهِمْ لِمَ شَهِدتُّمْ عَلَيْنَا ۖ قَالُوٓا۟ أَنطَقَنَا ٱللَّهُ﴾ وتیان: بە پێستەکانی خۆیان چۆن دژمان شایەتیتان دا؟ دەڵێن: خودا بە زمانی هێناین کە دەتوانێ هەموو شت بێنێتە قسە. وە لە فەرموودەی سەحیحدا هاتووە: ئەمە کێوێکە ئێمەی خۆش دەوێ ئێمەش خۆشمان دەوێ[4]. وەك پەرۆشی کۆتەرەکە کە خەبەرەکەی تەواتورە. وە لە سەحیحی موسلیما هاتووە: من بەردێك دەناسم لە مەککە کە سلاوی لێدەکەم پێش ئەوە پەوانە بکرێم، وە من ئێستاش هەردەیناسم[5]. وە لە سیفەتی بەردە ڕەشدا پێغەمبەری خودا(ﷺ) فەرمویەتی: بێگومان ئەو شایەتی ئەدات بۆ ئەوانەی سەلامیان لێ کردووە یان ماچیان کردووە بەڕاستی لە ڕۆژی قیامەتا[6]. (بێداریەك): زانایانی زمانی عەرەبی ڕای جیاوازیان هەیە لەم دەقەدا کە خودای گەورە ئەفەرمویت: ﴿فَهِىَ كَٱلْحِجَارَةِ أَوْ أَشَدُّ قَسْوَةً﴾ بوونە دڵڕەقێکی وەها لە چەشنی بەرد، بگرە ڕەقتریش لە بەرد. دوای ئەوە کە کۆ دەنگ بوون لەسەر ئەوەی کە هەرگیز ناگونجێ بۆگومان بێ هەندێکیان وتویانە (أو) بەمانای (الواو) هاتووە: ﴿فَهِىَ كَٱلْحِجَارَةِ أَوْ أَشَدُّ قَسْوَةً﴾ وەك ئەم ئایاتانەش کە خودای گەورە ئەفەرمویت: ﴿وَلَا تُطِعْ مِنْهُمْ ءَاثِمًا أَوْ كَفُورًا﴾[7] هەرگیز گوێ لەوانە مەگرە تاوانبار یا پێنەزانن. ڕوە ئەفەرمویت: ﴿عُذْرًا أَوْ نُذْرًا﴾[8] بۆ نەهێشتی بەهانە یان ترساندنی. هەندێ تر وتویانە: (أو) لێرەدا بە مانای (بل)ە. وا خەملێنراوە ﴿فَهِىَ كَٱلْحِجَارَةِ أَوْ أَشَدُّ قَسْوَةً﴾ وەك خودای

---

[1] النحل ٤٨.
[2] فصلت ١١.
[3] الحشر ٢١.
[4] فتح الباری /٦/٩٨ ص٧١.
[5] مسلم/٤/١٧٨٢.
[6] أحمد /١/٢٦٦.
[7] الانسان ٢٤.
[8] المرسلات ٦.

گەورەئەفەرموێت: ﴿إِذَا فَرِيقٌ مِّنْهُمْ يَخْشَوْنَ ٱلنَّاسَ كَخَشْيَةِ ٱللَّهِ أَوْ أَشَدَّ خَشْيَةً﴾[1] ئەوەندە لەو خەڵکە کە دەچن بە گژیاندا دەترسن، کە لە خوداش هەر ئەوەندە ترساون، بگرە زیاتریش دەترسان؟ وە ئەفەرموێت: ﴿وَأَرْسَلْنَٰهُ إِلَىٰ مِاْئَةِ أَلْفٍ أَوْ يَزِيدُونَ﴾[2] ناردومانە ناو سەد هەزاران یان زیاتر. وە ئەفەرموێت: ﴿فَكَانَ قَابَ قَوْسَيْنِ أَوْ أَدْنَىٰ﴾[3] بە ئەندازەی سەری نێوان دوو کەوان یان نزیکتر. هەندێکی تر وتویانە: ﴿فَهِىَ كَٱلْحِجَارَةِ أَوْ أَشَدُّ قَسْوَةً﴾ یانی: لەلای ئێوە. ئیبنو جەریر گێڕاویەتیەوە، هەندێکی تر وتویانە: یانی: دڵی ئێوە لەم دوو نمونەیە بەدەر نیە، یان وەك بەرد وایە لە ڕەقیدا، یان لەبەرد ڕەقترە. ئیبنو جەریرئەڵێت: مانای وایە لەسەر ئەم تەفسیرە، هەندێك دڵیان وەك بەرد وایە و هەندێکی تریان دڵیان لە بەرد ڕەقترە[4]. ئیبنو جەریر ئەم ڕایەی لا پەسەندە. منیش دەڵێم: ئەم قسەی دواییە لەم ئایەتە دەچێ کە خودای گەورە ئەفەرموێت: ﴿مَثَلُهُمْ كَمَثَلِ ٱلَّذِى ٱسْتَوْقَدَ نَارًا﴾ ئەمانە ڕاست بە وێنەی کەسانێ چوون کە خەریکی هەڵگیرساندنی ئاگرێك بوون. لەگەڵ ئەم ئایەتەدا کە ئەفەرموێت: ﴿أَوْ كَصَيِّبٍ مِّنَ ٱلسَّمَآءِ﴾[5] یان: هەروەك کەسانێ کە بارانی بە لێزمەیان بۆ بباریێ. وەك ئەم ئایەتەش کە ئەفەرموێت: ﴿وَٱلَّذِينَ كَفَرُوٓا۟ أَعْمَٰلُهُمْ كَسَرَابٍۭ بِقِيعَةٍ﴾[6] ئەوانەی خوانەناس بوون کردەوەیان وەك ئەو تراویلکە وایە کە لە بیاباندا هەیە. لەگەڵ ئەم دەقەدا کە خوای گەورە ئەفەرموێت: ﴿أَوْ كَظُلُمَٰتٍ فِى بَحْرٍ لُّجِّىٍّ﴾ یان: وەك لە تاریکستانێ لە دەریایەکی بێ پەیدا. واتە: هەیانە وەك ئەوە وایە یان هەیانە وەك ئەوەیان وایە، و الله أعلم.

﴿ ۞ أَفَتَطْمَعُونَ أَن يُؤْمِنُوا۟ لَكُمْ وَقَدْ كَانَ فَرِيقٌ مِّنْهُمْ يَسْمَعُونَ كَلَٰمَ ٱللَّهِ ثُمَّ يُحَرِّفُونَهُۥ مِنۢ بَعْدِ مَا عَقَلُوهُ وَهُمْ يَعْلَمُونَ ﴿٧٥﴾ وَإِذَا لَقُوا۟ ٱلَّذِينَ ءَامَنُوا۟ قَالُوٓا۟ ءَامَنَّا وَإِذَا خَلَا بَعْضُهُمْ إِلَىٰ بَعْضٍ قَالُوٓا۟ أَتُحَدِّثُونَهُم بِمَا فَتَحَ ٱللَّهُ عَلَيْكُمْ لِيُحَآجُّوكُم بِهِۦ عِندَ رَبِّكُمْ ۚ أَفَلَا تَعْقِلُونَ ﴿٧٦﴾ أَوَلَا يَعْلَمُونَ أَنَّ ٱللَّهَ يَعْلَمُ مَا يُسِرُّونَ وَمَا يُعْلِنُونَ ﴿٧٧﴾ ﴾

---

[1] النساء ٧٧.
[2] الصافات ١٤٧.
[3] النجم ٩.
[4] الطبری /٢/٢٣٦ ص٧١.
[5] البقرة ١٧.
[6] النور ٣٩.

**بێ هیوا بوون لە بڕوا هێنانی جوولەکە لەسەردەمی پێغەمبەردا(ﷺ)**

خودای گەورە ئەفەرموێت: ﴿أَفَتَطْمَعُونَ أَن يُؤْمِنُوا لَكُمْ﴾ ئایا ئێوە بە هیوان کە باوەڕتان پێ بێنن. واتە: ئەی خاوەنباوەڕان! ئایا ئومێد دەکەن کە ئەو کۆمەڵە گومڕایە لە جوولەکەکان گوێڕایەڵی فەرمانی ئێوە بن کە باو و باپیرانیان ئەو هەموو بەڵگە ئاشکرا و ڕونیان بە چاوی خۆیان بینی، دوای ئەوە دڵیان ڕەق بوو: ﴿وَقَدْ كَانَ فَرِيقٌ مِّنْهُمْ يَسْمَعُونَ كَلَامَ اللَّهِ ثُمَّ يُحَرِّفُونَهُ﴾ کەچی دەستەیەك هەر لەوانەی وتاری خوایان دەبیستن و لەپاش ئەوە تێی دەگەین، دەیان گۆڕی و دەشیان زانی کە دەیگۆڕن؟ واتە: بە شێوەیەکی تر تەفسیریان دەکرد، دوای ئەوە چاك دەیانزانی هەر ئەوە ڕاستە و دژایەتیان دەکرد، بەڕاستی ئەوانە بە هەڵەدا چوون بەو گۆڕینەی کردیان، ئەم باسە لێرەدا لەو ئایەتە دەچێ کە خودای گەورە ئەفەرموێت: ﴿فَبِمَا نَقْضِهِم مِّيثَاقَهُمْ لَعَنَّاهُمْ وَجَعَلْنَا قُلُوبَهُمْ قَاسِيَةً يُحَرِّفُونَ الْكَلِمَ عَن مَّوَاضِعِهِ﴾[1] ئەوسا لەبەر پاشگەزبوونەوەیان، وەبەر نەفرینی خۆمان خستن و ئەوەندە دڵمان ڕەق کردن، قسەکانی ناوەڕۆکی پەیمانی لە جێی خۆی نەهێشت، خۆیان شتیان لە جێی دانا. قەتادە لەم ئایەتەدا: ﴿ثُمَّ يُحَرِّفُونَهُ مِن بَعْدِ مَا عَقَلُوهُ وَهُمْ يَعْلَمُونَ﴾ لەپاش ئەوە تێی دەگەین، دەیان گۆڕی و دەشیان زانی کە دەیگۆڕن. ئەڵێت: ئەوانە جوولەکەکان بوون وتەی خودایان دەبیست لە پاش ئەوە تێدەگەیین دەیان گۆڕی[2]. موجاهید ئەڵێت: ئەوانەی وتەی خوایان دەگۆڕی و دەیان شاردەوە زاناکانی جوولەکە بوون[3]. ئیبنو وەهب ئەڵێت: ئیبنو زەیدە لەم ئایەتەدا ئەڵێت: ﴿يَسْمَعُونَ كَلَامَ اللَّهِ ثُمَّ يُحَرِّفُونَهُ﴾ وتاری خوایان دەبیست و لەپاش ئەوە لێی تێدەگەیین دەیانگۆڕی ئەو تەوراتەی کە خودا بۆی ڕەوانە کردن دەیان گۆڕی، حەڵاڵیان تێدا حەرام دەکرد و حەرامیشیان حەڵاڵ دەکرد تێیدا و هەقیان بە ناهەق و بەتاڵیان بە هەق دەدایە قەڵەم. ئەگەر کەسێکی خاوەن هەق بهاتایە لایان بە بەرتیلەوە کتێبی خوایان بۆ دەردەهێنا. ئەوە هەقی خۆی تێیدا دەستدەکەوت. وە ئەگەر کەسێ بە شتێکی ناهەق و بەتاڵەوە بهاتایە و بەرتیلی لەگەڵ خۆی بهێنایە ئەو کتێبەیان بۆ دەردەهێنا کە خۆیان دەستکاریان کردبوو ئەوە خاوەنی هەق بوو تێیدا. وە ئەگەر کەسێ بهاتایە لایان پرسیاری شتێکی لێبکردنایە هەقی تیا نەبوایە بەرتیل و هیچ شتێکی لەگەڵدا نەبوایە، فەرمانیان بە هەق بۆ ئەدا. خودای گەورە دەربارەیان ئەفەرموێت: ﴿أَتَأْمُرُونَ النَّاسَ بِالْبِرِّ

---

[1] المائدة ١٣.

[2] ابن ابی حاتم/١/٢٦٣ ص٧١.

[3] الطبری /٢/٢٤٥ ص٧٢.

وَتَنسَوْنَ أَنفُسَكُمْ وَأَنتُمْ تَتْلُونَ ٱلْكِتَٰبَ ۚ أَفَلَا تَعْقِلُونَ ﴾[1] ئایا ئێوە فەرمان بەو مەردومە ئەدەن کە چاکە بکەن، خۆتانی لێهەلاّ دەوێرن، هەر خۆشتان کتێب خوێنەوەن؟ دەسا چیتانە تێناگەن[2].

## جوولەکە دانیان دەنا بە پێغەمبەری موحەممەدا (ﷺ) بەلاّم بڕوایان پێنەدەکرد

خودای گەورە ئەفەرموێت: ﴿ وَإِذَا لَقُوا۟ ٱلَّذِينَ ءَامَنُوا۟ قَالُوٓا۟ ءَامَنَّا وَإِذَا خَلَا بَعْضُهُمْ إِلَىٰ بَعْضٍ ﴾ هەرکاتێك تووشی باوەڕداران دەبن دەڵێن: باوەڕمان هێناوە، هەرکاتێ دەگەنە یەکتری پێیان دەڵێن، ئایا ئێوە ئەو زانستەی خودا پێی داون لای ئەوان ئەیدرکێنن، تابیکەنە بەڵگەی خۆیان لەلای پەروەردگاری ئێوە؟ دە ئاخر تا کەی تێناگەن. موحەممەدی کوڕی ئیسحاق ڕیوایەتی کردووە لە ئیبنو عەباسەوە: ﴿ وَإِذَا لَقُوا۟ ٱلَّذِينَ ءَامَنُوا۟ قَالُوٓا۟ ءَامَنَّا ﴾ واتە: پێبگەیشتنایە بە خاوەنباوەڕان دەیان وت: باوەڕمان هێناوە. موحەمەدیش پێغەمبەری خودایە(ﷺ) بەلاّم بە تایەبەتی بۆ ئێوە هاتووە[3]. کاتێکیش دەگەیشتنە یەکتری دەیان وت: بەو شێوەیە قسە بۆ عەرەبەکان مەکەن، ئەگەر پێیان بلێن لەوان بووە دەیکەنە بەڵگە لەسەرتان لەلای خودا، خودای گەورە ئەم ئایەتەی نارده خوارەوە: ﴿ وَإِذَا لَقُوا۟ ٱلَّذِينَ ءَامَنُوا۟ قَالُوٓا۟ ءَامَنَّا وَإِذَا خَلَا بَعْضُهُمْ إِلَىٰ بَعْضٍ قَالُوٓا۟ أَتُحَدِّثُونَهُم بِمَا فَتَحَ ٱللَّهُ عَلَيْكُمْ لِيُحَآجُّوكُم بِهِۦ عِندَ رَبِّكُمْ ۚ ﴾ هەرکاتێ توشی باوەڕداران دێن دەڵێن: باوەڕمان هێناوە، هەرکاتێ دەگەنە یەکتری پێیان دەڵێن: ئایا ئێوە ئەو زانستەی خودا پێی داون لای ئەوان باسی دەکەن، تا بیکەنە بەڵگەی خۆیان لەلای پەروەردگاری ئێوە؟ واتە: دەڵێن: ئەو پێغەمبەرە خۆتان دەزانن کە بەڵێنتان لێوەرگیراوە شوێنی بکەون، ئەویش هەواڵیان پێئەدات، کە ئەو پێغەمبەرەیە کە ئێمە چاوەڕوانمان دەکرد لە کتێبەکەی خۆماندا دەیزانین، بڕوای پێمەکەن و دانی پێدا مەنێن. خودای گەورە ئەفەرموێت: ﴿أَوَلَا يَعْلَمُونَ أَنَّ ٱللَّهَ يَعْلَمُ مَا يُسِرُّونَ وَمَا يُعْلِنُونَ ﴾ بۆچی ئەمانە نازانن هەرچی نەهێنی دڵیانە و هەرچی بە ئاشکرا دەیلێن خودا دەیزانێ؟رحەسەنی بەسری ئەڵێت: ئەو جوولەکانە ئەوسا کاتێ کە دەگەینە باوەڕداران دەیان وت باوەڕمان هێناوە، کاتێکیش دەگەینە یەکتری لە ناو خۆیاندا دەیان وت، ئەوەی خودا ئاگاداری کردوون لە کتێبەکەتاندا هاوەڵەکانی موحەممەد (ﷺ) لێ ئاگادار مەکەن تا بیکەنە بەڵگە لەلای خوداو ڕوو بە ڕووتان بوەستن دەربارەی[4]. خودای گەورەئەفەرموێت: ﴿أَوَلَا يَعْلَمُونَ أَنَّ ٱللَّهَ يَعْلَمُ مَا يُسِرُّونَ

---

[1] البقرة ٤٤.

[2] الطبری /٢/٢٤٦ ص٧٢.

[3] الطبری /٢/٢٥٠.

[4] ابن ابی حاتم /١/٢٣٩ ص٧٢.

وَمَا يُعْلِنُونَ﴾ بۆچی ئەوانە نازانن هەرچی ئەهێنی دڵیانە و هەرچی بە ئاشکرا دەیڵێن خوا دەیزانێ؟ ئەبەولعالیە ئەڵێت: یانی: ئەوە شاردویانەتەوە لە بڕوا نەکردنیان بە موحەمەد(ﷺ) و حاشاکردنیان لێی، بە نوسراویی لەلای خۆیان هەیە و چاك دەیزانن. قەتادەیش هەروای وتووە. حەسەن ئەڵێت: ﴿أَنَّ اللَّهَ يَعْلَمُ مَا يُسِرُّونَ﴾ ئەوەی دەیشارنەوە خوا دەیزانێ. ئەوەیان دەشاردەوە کاتێ کە لەلای هاوەڵەکانی پێغەمبەر (ﷺ) دەگەڕانەوە و دەگەین بە یەکتری، لەناو خۆیاندا دەیان وت: نابێ هیچ کەسێکیان بە هاوەڵەکانی موحەمەد بڵێن(ﷺ) بەوەی خودا ئاگاداری کردوون لە کتێبەکەی خۆیاندا، لە ترسی ئەوەی نەکا هاوەڵەکانی موحەمەد(ﷺ) ئەوە بکەنە بەڵگە بەسەریانەوە کە بە ئاشکرا دەیڵێن لەلای پەروەردگاریان[1]. واتە: کاتێ کەوتیان بە هاوەڵەکانی موحەمەد(ﷺ) باوەڕمان هێنا، ئەبو لعایلە و قەتادەش هەروایان وتووە[2].

﴿وَمِنْهُمْ أُمِّيُّونَ لَا يَعْلَمُونَ الْكِتَابَ إِلَّا أَمَانِيَّ وَإِنْ هُمْ إِلَّا يَظُنُّونَ ﴿٧٨﴾ فَوَيْلٌ لِّلَّذِينَ يَكْتُبُونَ الْكِتَابَ بِأَيْدِيهِمْ ثُمَّ يَقُولُونَ هَٰذَا مِنْ عِندِ اللَّهِ لِيَشْتَرُوا بِهِ ثَمَنًا قَلِيلًا ۖ فَوَيْلٌ لَّهُم مِّمَّا كَتَبَتْ أَيْدِيهِمْ وَوَيْلٌ لَّهُم مِّمَّا يَكْسِبُونَ ﴿٧٩﴾﴾

### مانای نەخوێنەوار (الامی)

خودای گەورە ئەفەرموێت: ﴿وَمِنْهُمْ أُمِّيُّونَ لَا يَعْلَمُونَ الْكِتَابَ إِلَّا أَمَانِيَّ وَإِنْ هُمْ إِلَّا يَظُنُّونَ﴾ لەوانیشدا هی وا هەن کە نەخوێندەوارن و بێجگە ئارەزوو، لە کتێب سەر دەرناکەن، ئەمانە هەرلە خەیالات و گوماندان، خودای گەورەئەفەرموێت: ﴿وَمِنْهُمْ أُمِّيُّونَ﴾ واتە: لە ئەهلی کتێب هەن نەخوێندەوارن. موجاهید ئەڵێت: (الامیون) کۆی (أمی)یە، ئەو کەسەیە کە ناتوانێ بنوسێ. ئەبولعالیە و ڕەبیع و قەتادە و ئیبراهیمی نە خەعی و کەسانی تریش وتویانە، هەر وادیارە لەم ئایەتەوە کە خوای گەورە ئەفەرموێت: ﴿لَا يَعْلَمُونَ الْكِتَابَ﴾ واتە: نازانن ئەو کتێبە (تەورات) چی تێدایە[3]. هەر بۆیە لە وەسفی پێغەمبەرا (ﷺ) هاتووە کە نەخوێندەوارە چونکە نەی دەزانی بنوسێ. وەك خودای مەزن ئەفەرموێت: ﴿وَمَا كُنتَ تَتْلُو مِن قَبْلِهِ مِن كِتَابٍ وَلَا تَخُطُّهُ بِيَمِينِكَ ۖ إِذًا لَّارْتَابَ الْمُبْطِلُونَ﴾[4] تۆ بەرلەوە

[1] ابن ابی حاتم /١/٢٤٠.
[2] ابن ابی حاتم /١/٢٤٠.
[3] ابن ابی حاتم /١/٢٤١.
[4] العنكبوت ٤٨.

قورئانت بۆ بێتە خوارێ، نەت دەتوانی هیچ کتێبێ بخوێنیتەوە یان بەدەستی خۆت بینوسی ئەگەر وابوایە دڵچەپەڵان گومانیان لێپەیدا دەبوو. پێغەمبەری خودا(ﷺ) فەرمویەتی: ئێمە گەلێکی نەخوێندەوارین نانوسین و هەژماری مانگیش ناکەین ئاواو ئاواو ئاوا[1]. واتە: لە خوا پەرستی و کاتە دیاری کراوەکاندا پێویستمان بە نوسین وەهەژمارکردن نیە. خودای گەورەش ئەفەرموێت: ﴿هُوَ ٱلَّذِي بَعَثَ فِي ٱلْأُمِّيِّـۧنَ رَسُولًا مِّنْهُمْ﴾[2] هەر ئەویشە لە ناو نەخوێندەواراندا پێغەمبەرێکی لە خۆیان بۆ ناردوون.

## تەفسیری ئارەزو ئاوات (الامانی)

زەححاك لە ئیبنو عەباسەوەئەڵێت: ﴿إِلَّآ أَمَانِيَّ﴾ ئەفەرموێت: جگە لە قسەیەکە دەیکەن هەر بەدەمیان دەڵێن بە درۆوە[3]. وتراوە: جگە لە ئارەزوێ کە حەزی لێدەکەن. موجاهیدئەڵێت: ئەو نەخوێندەوارانەی کە خودا وەسفی کردوون لە هیچ تێناگەن لەو کتێبەی کە خودا ڕەوانەی کردووە بۆ موسا سەلامی خوای لێبێ بەڵام ئەوانە هەر خەریکی درۆ هەڵبەستن. وە هەر خەریکی شتی پڕو پوچن بە درۆو بوختان کردن[4]. ئاوات خواستن لێرەدا مەبەست پێی دروستکردنی درۆ و خەیاڵ کردنە پێیەوە. موجاهید ئەڵێت: ﴿وَإِنْ هُمْ إِلَّا يَظُنُّونَ﴾ئەمان هەر درۆ دەکەن[5]. قەتادە و ئەبولعالیە و ڕەبیع وتیان: ئەوانە هەر دوای گومان دەکەون بەرامبەر بە خودا بە ناهەق[6].

## هاوار بۆئەو جوولەکانەی کە کتێبی خودا دەگۆڕن

خودای گەورە ئەفەرموێت: ﴿فَوَيْلٌ لِّلَّذِينَ يَكْتُبُونَ ٱلْكِتَٰبَ بِأَيْدِيهِمْ ثُمَّ يَقُولُونَ هَٰذَا مِنْ عِندِ ٱللَّهِ لِيَشْتَرُوا۟ بِهِۦ ثَمَنًا قَلِيلًا﴾ هاوار بۆ ئەوانە بەدەستی خۆیان کتێبەکە دەنوسن و پاشان دەڵێن: ئەمە لە خواوە هاتووە. تا بە نرخێکی کەم بیفرۆشن. ئەمانە دەستەیەکی ترن لە جوولەکە، کە بانگ خوازن بۆ گومڕایی بە درۆو بوختان هەڵبەستن بۆ خودا و خواردنی ماڵی خەڵکی بە شتی پڕو پوچ (الویل) یانی: هاوارو لەناو چوون، وتەیەکی بەناو بانگە لە زمانی عەرەبیدا. زوهری ئەڵێت: عەبدڵڵای کوڕی عەبدڵڵا هەواڵی دامێ لە ئیبنو عەباسەوە کە وتویەتی: ئەی کۆمەڵی مسوڵمانان! چۆن پرسیار لە ئەهلی کتێب دەکەن لە هیچ شتێ کە ئەو قورئانەی خودا ناردویەتیە خوارەوە بۆ پێغەمبەرەکەتان تازە

---

[1] فتح الباری /٤/١٥١ ص٧٢.

[2] الجمعة ٢.

[3] الطبری /٢/٢٦١.

[4] الطبری /٢/٢٦٢.

[5] ابن ابی حاتم /١/٢٤٢.

[6] ابن ابی حاتم /١/٢٤٢.

ترین هەواڵی خودای تێدایە. دەیخوێننەوە تەڕ گەش و پاراوە و زۆری بەسەرا نەچووە. خودای گەورەیش باسی ئەهلی کتێبی بۆ کردوون کە کتێبی خودایان گۆڕیوەو دەسکاریان کردوە بە دەستی خۆیان و دەڵێن: ئەمە لەلایەن خوداوە هاتووە. بە نرخێکی کەم دەیفرۆشن، ئایا خودا ڕێگری لێنەکردوون و ئاگاداری نەکردوون کە پرسیاریان لێ نەکەن، سا بەخوا هەرگیز نەمان دیوە یەکێ لەوان هاتبێ و پرسیاری لە ئێوە کردبێ دەربارەی ئەوە کە بۆ ئێوە هاتۆتە خوارەوە[1]. بوخاریش ڕیوایەتی کردووە[2]. حەسەنی کوڕی حەسەنی بەسری ئەڵێت: (الثمن القليل) یانی: دنیاوهەموو شتەکانی[3]. پاشان خودای گەورە ئەفەرموێت: ﴿فَوَيۡلٞ لَّهُم مِّمَّا كَتَبَتۡ أَيۡدِيهِمۡ وَوَيۡلٞ لَّهُم مِّمَّا يَكۡسِبُونَ﴾ هاوار لەوان لەوەی بە دەست نوسیویانە و هاوار لەوان بۆ نرخێ دەستیان کەوتووە. واتە: هاوار بۆ ئەوانە کە بەدەستی خۆیان ئەو درۆو بوختانانەیان نوسیوە هاوار بۆ ئەوانە کە ماڵی خەڵکی بە حەرامی دەخۆن. وەك زەححاك لە ئیبنو عەباسەوە ڕەزای خوای لێبێ ئەڵێت: ﴿فَوَيۡلٞ لَّهُم﴾ جەزرەبەو سزای سەخت بۆ ئەوانە کەبەدەستی خۆیان ئەو درۆیە دەکەن. ﴿وَوَيۡلٞ لَّهُم مِّمَّا يَكۡسِبُونَ﴾ سزای سەخت بۆ ئەو کەسانەی ماڵی خەڵکی نەفام وکەسانی تریش دەخۆن[4].

﴿وَقَالُواْ لَن تَمَسَّنَا ٱلنَّارُ إِلَّآ أَيَّامٗا مَّعۡدُودَةٗۚ قُلۡ أَتَّخَذۡتُمۡ عِندَ ٱللَّهِ عَهۡدٗا فَلَن يُخۡلِفَ ٱللَّهُ عَهۡدَهُۥٓۖ أَمۡ تَقُولُونَ عَلَى ٱللَّهِ مَا لَا تَعۡلَمُونَ ﴿٨٠﴾﴾

**لە هیواکانی جوولەکە،کە ئەوان چەند ڕۆژێ نەبێ لەناو ئاگرا نامێننەوە**

خودای گەورە ئەفەرموێت: ﴿وَقَالُواْ لَن تَمَسَّنَا ٱلنَّارُ إِلَّآ أَيَّامٗا مَّعۡدُودَةٗۚ﴾ دەڵێن: ئاگر توشمان نابێ، مەگین چەند ڕۆژێ ئەویش کەم. خودای گەورە باسی جوولەکە دەکا لەبارەی ئەوەی گێڕاویانەتەوەو دەیلێن دەربارەی خۆیان. کە چەند ڕۆژێ نەبێ ناچنە ناو ئاگر و پاشان لێی دێنە دەرەوەو ڕزگاریان دەبێ. خودای گەورەیش وەڵامیان ئەداتەوە و ئەفەرموێت: ﴿قُلۡ أَتَّخَذۡتُمۡ عِندَ ٱللَّهِ عَهۡدٗا﴾ بڵێ: ئایا خودا بەڵێنی پێداون کە خودا لە بەڵێنی خۆی پەشیمان نابێتەوە یان هەر لەنەزانیەوە قسە لەسەر خودا دەکەن. واتە: ئەگەر خودا بەڵێنی دابێ، ئەوا پەشیمان نابێتەوە لێی. بەڵام شتی وا نەبووە و ڕوشی نەداوە. هەر بۆیە بە پیتی (أم) کە بەمانای (بل) هاتووە. واتە: بەڵکو

---

[1] ابن ابی حاتم /١/٢٤٥ ص٧٣.

[2] فتح الباری /٥/٣٤٤/١٣/٣٤٥/٥٥٥.

[3] ابن ابی حاتم/١/٢٤٧.

[4] الطبری /٢/٢٧٣.

هەر لەنەزانیەوە درۆو بوختان بەدەم خوداوە هەڵدەبەستن. عەوفی لە ئیبنو عەباسەوەئەڵێت: ﴿وَقَالُواْ لَن تَمَسَّنَا ٱلنَّارُ إِلَّآ أَيَّامًا مَّعۡدُودَةً﴾ وتیان: ئاگر تووشمان نابێ، مەگین چەند ڕۆژێ ئەویش کەم. وتی: جوولەکە وتویانە ئێمە توشی ئاگر نابین تەنیا چل ڕۆژ نەبێ[1]. هەندێ جگە لە ئیبنو عەباس ئەمەی بۆ زیاد کردووە. ئەو ماوەی کە گوێرەکەکەیان پەرستووە. حافیز ئەبو بەکری کوڕی مەردەویهی لە ئەبو هورەیرەوە ئەڵێت: کاتێ کە خەیبەر فەتح کرا، مەڕێك بە دیاری نێرا بۆ پێغەمبەری خودا(ﷺ) ژەهری پێوە کرابوو پێغەمبەری خودا(ﷺ) فەرمووی: هەرچی جوولەکە هەیە لێرە بۆم کۆبکەنەوەپێغەمبەری خودا (ﷺ) فەرموی پێیان: باوکی ئێوە کێیە؟ وتیان: فلان. فەرموی: درۆتان کرد بەڵکو باوکتان فلانە. وتیان: ڕاست و چاکت فەلاموە. پاشان فەرموی پێیان: ئایا بڕواتان پێم هەیە، ئەگەر دەربارەی شتێ پرسیارم لێکردن؟ وتیان بەڵێ، ئەی ئەبو قاسم. ئەگەر درۆمان لەگەڵ کردی، دەزانی درۆمان کردووە، وەك دەربارەی باوکمان زانیوتە. پێغەمبەر (ﷺ) فەرموی پێیان: ئەوانەی ئەهلی ئاگر کێن؟وتیان: ئێمە ماوەیەکی کەم تێیدا دەبین، پاشان ئێوە دوای ئێمە دەمێننەوە تێیدا. پێغەمبەری خودا (ﷺ) فەرموی پێیان: قسەمەکەن سوێند بە خو اهەرگیز ئێمە دوای ئێوە نامێنینەوە تێیدا، پاشان پێغەمبەری خودا(ﷺ) فەرموی پێیان: ئایا بڕواتان پێم هەیە، ئەگەر دەربارەی شتێ پرسیارم لێکردن؟ وتیان: بەڵێ، ئەی ئەبوقاسم، فەرموی: ئایا ژەهرتان کردبویە ناو ئەم مەڕەوە؟ وتیان: بەڵێ، فەرموی: چی پاڵی پێوە نان بۆ ئەوە؟ وتیان: ویستمان ئەگەر تۆ درۆت کرد نەجاتمان ببێت لێت. وە ئەگەر پێغەمبەریش بی زیانت پێ ناگەیەنێ[2]. ئیمامی ئەحمەد و بوخاری و نەسائیش هەر بەو جۆرە ڕیوایەتیان کردووە[3].

﴿بَلَىٰ مَن كَسَبَ سَيِّئَةً وَأَحَٰطَتۡ بِهِۦ خَطِيٓـَٔتُهُۥ فَأُوْلَٰٓئِكَ أَصۡحَٰبُ ٱلنَّارِۖ هُمۡ فِيهَا خَٰلِدُونَ ٨١ وَٱلَّذِينَ ءَامَنُواْ وَعَمِلُواْ ٱلصَّٰلِحَٰتِ أُوْلَٰٓئِكَ أَصۡحَٰبُ ٱلۡجَنَّةِۖ هُمۡ فِيهَا خَٰلِدُونَ ٨٢﴾

خودای گەورە ئەفەرموێت: ﴿بَلَىٰ مَن كَسَبَ سَيِّئَةً وَأَحَٰطَتۡ بِهِۦ خَطِيٓـَٔتُهُۥ فَأُوْلَٰٓئِكَ أَصۡحَٰبُ ٱلنَّارِۖ هُمۡ فِيهَا خَٰلِدُونَ﴾ دیارە هەرکەسێ خۆی توشی خراپە بکا و خراپەکەی دەوری دابێ ئەوانە یاری ئاگرن و تا هەتایە هەر تێیدا دەبن. خودای گەورە ئەفەرموێت: بەو جۆرە نەبوو بە هیوای بوون و ئارەزوتان دەکرد، بەڵکو کارەکە بەم شێوەیە، هەرکەسێ خراپە بکا و خراپەکەی دەوری دابێ و بگاتە

---

[1] الطبری /٢/٢٧٦.

[2] دلائل النبوة /٤/٢٥٦/سە حیحە ص٧٣.

[3] أحمد/٢/٤٥١، وفتح الباری/٦/٣١٤، و النسائی فی الکبرا/٦/٤١٣.

ڕۆژی قیامەت، هیچ چاکەیەکی نەبێ و هەمو کردارەکانی خراپە کاری بێت، ئەوا بێگومان خەڵکی ناو ئاگرە: ﴿ وَٱلَّذِينَ ءَامَنُواْ وَعَمِلُواْ ٱلصَّٰلِحَٰتِ ﴾ ئەوانەش کە باوەڕ دارو ئاکار چاك بوون، بەهەشتین و هەر لەوێدا دەمێننەوە. واتە: ئەوانەی خاوەنباوەڕن و ئاکار چاکن و کردارەکانیان بە پێی شەریعەت بووە، بێگومان ئەوانە خەڵکی بەهەشتن. ئەم ئایەتە لەو ئایەتانە دەچێ کە خودای گەورە ئەفەرموێت: ﴿ لَّيْسَ بِأَمَانِيِّكُمْ وَلَآ أَمَانِيِّ أَهْلِ ٱلْكِتَٰبِ ۗ مَن يَعْمَلْ سُوٓءًا يُجْزَ بِهِۦ وَلَا يَجِدْ لَهُۥ مِن دُونِ ٱللَّهِ وَلِيًّا وَلَا نَصِيرًا ﴿١٢٣﴾ وَمَن يَعْمَلْ مِنَ ٱلصَّٰلِحَٰتِ مِن ذَكَرٍ أَوْ أُنثَىٰ وَهُوَ مُؤْمِنٌ فَأُوْلَٰٓئِكَ يَدْخُلُونَ ٱلْجَنَّةَ وَلَا يُظْلَمُونَ نَقِيرًا ﴾[1] نە بە ئاواتی ئێوەیە و نە بە هەواو ئارەزوی ئەو کەسانەیە بە ئەهلی کتێب هەژمار دەکرێن، هەر مرۆڤێك کاری نالەبار بکا بەو کارەی خۆی سزا ئەدرێت، جگە لە خودا هیچ کەس دەستی ناکەوێ دۆستی بێ و بە هاواریەوە بێت. هەر مرۆڤێکیش نێر بێ یان مێ کە باوەڕدارو ئاکار چاك بێ، دەچێتە بەهەشت و بە ئەندازەی تلیشی وردیلەی ناوکە خورمایەك ناهەقیان لێناکرێ. ئەبو هورەیرە و ئەبووائیل و عەتا و حەسەن ئەڵێن: ﴿وَأَحَٰطَتْ بِهِۦ خَطِيٓـَٔتُهُۥ﴾ یانی: بتپەرستیەکەی دەوری دابوو[2]. ئەعمەش لە ئەبو ڕەزینەوە لە ڕەبیعی کوڕی خوسەیمەوە ئەڵێت: ﴿وَأَحَٰطَتْ بِهِۦ خَطِيٓـَٔتُهُۥ﴾ خراپەکانی دەوری داوە. وتی: ئەو کەسەی بەو خراپانەوە کردویەتی بەر لەوە تەوبە بکا بمرێ[3]. سوددی و ئەبو ڕەزینیش هەر وایان وتووە[4]. ئەبولعالیە و موجاهید و حەسەن لە ڕیوایەتێکا هەروایان وتووە. قەتادە و ڕەبیعی کوڕی ئەنەس ئەڵێن: ﴿وَأَحَٰطَتْ بِهِۦ خَطِيٓـَٔتُهُۥ﴾ خراپەکانی دەوری دابێ لە گوناهە گەورەکان[5]. ئەم هەموو ڕاو بۆچونانە لە مانادا لەیەکەوە نزیکن، و الله أعلم.

### تاوانی بچوك کاتێ کە کۆبۆوە، لەناو بەرن

لێرەدا ئەم فەرمودە کە ئیمامی ئەحمەد ڕیوایەتی کردووە لە عەبدڵڵای کوڕی مەسعودەوە ڕەزای خوای لێبێ هاتووە کە پێغەمبەری خودا (ﷺ) فەرمویەتی: خۆتان بپارێزن لە گوناهە بچوکەکان، چونکە ئەوانە کۆدەبنەوە لەسەر پیاو تا لەناوی ئەبەن. وە پێغەمبەری خودا(ﷺ)نمونەیەکی بۆ مێنانەوە: وەك نمونەی کۆمەڵە کەسێ لە زەویەکی چۆڵەوانیدا دابەزن و ئامادەی کرداری کۆمەڵێ بن،

---

[1] النساء ١٢٣-١٢٤.

[2] ابن ابی حاتم /١/٢٥٢ ص٧٤.

[3] ابن ابی حاتم /١/٢٥٢.

[4] ابن ابی حاتم /١/٢٥٣.

[5] ابن ابی حاتم /١/٢٥٣.

پیاوێ بڕوا چیلکەیە بێنێ و پیاوێکی تریش چیلکەیە بێنێ و هەندێکیان کۆکردەوە و ئاگریان تێبەردا و ئەوەی فرێیان دابووە ناوی پێیان گەیاندەوە[1]. وە موحەمەدی کوڕی ئیسحاق ڕیوایەتی کردووە لە ئیبنو عەباسەوە: ﴿ وَالَّذِينَ ءَامَنُوا وَعَمِلُوا الصَّالِحَاتِ أُولَئِكَ أَصْحَابُ الْجَنَّةِ هُمْ فِيهَا خَالِدُونَ ﴾ ئەوانەش کە باوەڕدارو ئاکار چاك بوون، بەهەشتین و هەر لەوێدا دەمێننەوە. واتە: ئەوانەی بڕوایان هێناوە بەوەی کە ئێوە ئەی جوولەکە! حاشاتان لێکردووە و کار بەوە دەکەن کە ئێوە وازتان لێهێناوە لە ئاینی خوا ئەوانە جێیان بەهەشتە و تاهەتایە تێیدا دەمێننەوە. هەواڵی پێداون کە پاداشتی چاکە و خراپە بەردەوام دەبێ لەسەر ئەوانە و هەرگیز لێیان نابڕێ و دوایی نایەت[2].

﴿وَإِذْ أَخَذْنَا مِيثَاقَ بَنِي إِسْرَاءِيلَ لَا تَعْبُدُونَ إِلَّا اللَّهَ وَبِالْوَالِدَيْنِ إِحْسَانًا وَذِي الْقُرْبَى وَالْيَتَامَى وَالْمَسَاكِينِ وَقُولُوا لِلنَّاسِ حُسْنًا وَأَقِيمُوا الصَّلَاةَ وَءَاتُوا الزَّكَاةَ ثُمَّ تَوَلَّيْتُمْ إِلَّا قَلِيلًا مِّنكُمْ وَأَنتُم مُّعْرِضُونَ ﴿٨٣﴾﴾

## پەیمانی نەوەی ئیسرائیل

خودای گەورە ئەفەرموێت: ﴿وَإِذْ أَخَذْنَا مِيثَاقَ بَنِي إِسْرَاءِيلَ لَا تَعْبُدُونَ إِلَّا اللَّهَ وَبِالْوَالِدَيْنِ إِحْسَانًا وَذِي الْقُرْبَى وَالْيَتَامَى وَالْمَسَاكِينِ وَقُولُوا لِلنَّاسِ حُسْنًا وَأَقِيمُوا الصَّلَاةَ وَءَاتُوا الزَّكَاةَ ثُمَّ تَوَلَّيْتُمْ إِلَّا قَلِيلًا مِّنكُمْ وَأَنتُم مُّعْرِضُونَ ﴾ ئەو کاتەیش کە پەیمانمان لە نەوەی ئیسرائیل وەرگرت، جگە لە خودا نەپەرستن و چاکە لەگەڵ دایك و باب و نزیکان و هەتیوو هەژاران بکەن و قسەی باش بۆ مەردم بکەن، نوێژ بکەن، زەکات بدەن لە دوا ئەوە کۆمەڵێك نەبێ پشتتان تێکرد وخۆتان لە پەیامەکە لادا. خوای گەورە لێرەدا باسی نەوەی ئیسرائل دەکا کە چەند فەرمانێکی بەسەریاندا دا و پەیمانی لێوەرگرتن لەسەری. بەڵام ئەوان پەیمانەکەیان بە جێ نەهێنا و پشتیان تێکرد، بە ئارەزو وئەنقەست دژی وەستان. خۆشیان چاك دەیان زانی و باسیشیان دەکرد. خودای گەورە فەرمانی پێداون کە تەنیا ئەو بپەرستن و شەریکی بۆ پەیدا نەکەن لە هیچ شتێکدا، فەرمانیشی بە هەموو خەڵکی هەر بەو شێوەیە داوە. هەر بۆ ئەوەش وەدی هێناون. وەك ئەفەرموێت: ﴿وَمَا أَرْسَلْنَا مِن قَبْلِكَ مِن رَّسُولٍ إِلَّا نُوحِي إِلَيْهِ أَنَّهُ لَا إِلَهَ إِلَّا أَنَا فَاعْبُدُونِ ﴾[3] بەر لەتۆش ئێمە هەر پێغەمبەرێکمان نارد، ڕامان سپارد کە هیچ

---

[1] أحمد /١/٤٠٢ حه سه نه ص٧٤.

[2] ابن ابی حاتم /١/٢٥٤.

[3] الانبياء ٢٥.

پەرستویەك جگە لە من نیە و هەر تانیا من بپەرستن. وە ئەفەرموێت: ﴿ وَلَقَدْ بَعَثْنَا فِي كُلِّ أُمَّةٍ رَسُولًا أَنِ اعْبُدُوا اللَّهَ وَاجْتَنِبُوا الطَّاغُوتَ ﴾[1] بۆ ناو هەموو کۆمەڵێکپێغەمبەرێکمان بەڕێ کرد، کە خودا بپەرستن و لە شەیتان دورە پەرێز بن. ئەمە بەرزترین و گەورەترین حقوقە، کە هەقی خودای مەزنە کە تەنیا ئەو بپرسترێ و شەریکی نیە. پاشان هەقی دروستکراوەکانی دێت، کە خودای گەورە جەختی لەسەر کردوەتەوە لە هەموویان لە پێشتر هەقی دایك و باوکە. هەر بۆیە خودا هەقی دایك و بابی لەپاڵ هەقی خۆی داناوە وەك ئەفەرموێت: ﴿أَنِ اشْكُرْ لِي وَلِوَالِدَيْكَ إِلَيَّ الْمَصِيرُ ﴾[2] تۆ سوپاسی من بکە و سوپاسی دایك و باوکت بکە، دوا جار دێنەوە بۆ لای من. وە ئەفەرموێت: ﴿وَقَضَىٰ رَبُّكَ أَلَّا تَعْبُدُوا إِلَّا إِيَّاهُ وَبِالْوَالِدَيْنِ إِحْسَانًا ﴾[3]. پەروەردگارت فەرمانی دا کە جگە لەو مەپەرستن و دەربارەی دایك و بابیش چاکە بکەن. تا دەگاتە ئەوە دە دەفەرموێت: ﴿ وَآتِ ذَا الْقُرْبَىٰ حَقَّهُ وَالْمِسْكِينَ وَابْنَ السَّبِيلِ﴾ خزمان بەشی خۆی بدەرێ، هەژارو لە ڕێدامایش بێبەش مەکە. وە لە هەردوو سەحیحەکەدا هاتووە لە ئیبنو مەسعودەوە، وتم: ئەی پێغەمبەری خودا(ﷺ) کام کار زۆر چاکە؟ فەرموی: نوێژ لەکاتی خۆیدا، وتم: پاشان چی؟ فەرموی: چاکە کردن لەگەڵ دایك و باوکا. وتم: پاشان چی؟ فەرموی: جیهاد لە ڕێی خوادا[4]. ﴿وَالْيَتَامَىٰ﴾ ئەو منداڵە بچوکانەی باوکیان نیەهەر کارێکیان بۆ بکات. ﴿وَالْمَسَاكِينِ﴾ ئەو کەسانەن کە شتێ شك نابەن بۆ خۆیان و ماڵ و منداڵیان خەرجی بکەن. بەو زوانە باسی ئەو کۆمەڵانە دێت لە سوورەتی نیسائدا کە خودای گەورە بە ئاشکرا فەرمانمان پێدەکا و ئەفەرموێت: ﴿وَاعْبُدُوا اللَّهَ وَلَا تُشْرِكُوا بِهِ شَيْئًا ۖ وَبِالْوَالِدَيْنِ إِحْسَانًا﴾[5] تەنیا خودا بپەرستن و هیچ شت مەکەن بە شەریکی، دەربارەی دایك و باوکتان تا دەتوانن چاکە بکەن. پاشان خودای گەورە ئەفەرموێت: ﴿وَقُولُوا لِلنَّاسِ حُسْنًا﴾ قسەی چاك بکەن لەگەڵ خەڵکیدا. واتە: قسەی چاکیان لەگەڵا بکەن و نەرم ونیان بن لەگەڵیان. فەرمان بە چاکە و بەرگری کردن لە خراپە دەچێتە پاڵ ئەمە. وەك حەسەنی بەسری لەم دەقەدا کە خوای گەورە ئەفەرموێت: ﴿وَقُولُوا لِلنَّاسِ حُسْنًا﴾ قسەی چاك بکەن لەگەڵ خەڵکیدا. وتی:

---

[1] النحل ٣٦.

[2] لوقمان ١٤.

[3] الاسراء ٢٦.

[4] فتح الباری /٦/٥/، مسلم/١/٨٩ ص٧٤.

[5] النساء ٣٦.

قسەی چاك فەرمان كردنە بە چاكە و بەرگری كردنە لە خراپە و هێمنی و لەسەر خۆیی و چاپۆشی و لێبوردەییە و قسەی چاك كردنە لەگەڵ خەڵكا وە خودای گەورە فەرمویەتی هەموو ڕەوشتێكی چاكە كە خودا لێی ڕازی بێ[1]. ئیمامی ئەحمەد ڕیوایەتی كردووە لە ئەبو زەڕەوە ڕەزای خوای لێبێ لە پێغەمبەرەوە(ﷺ) فەرمویەتی: هیچ شتێ بەكەم مەزانن لە چاكە كردن، ئەگەر دەستت نەكەوت، بە ڕوویەكی خۆش و كراوە بەرەو ڕوی براكەت ببەوە[2]. موسلیم لە سەحیحەكەیدا هێناویەتی. تیرمزیش ڕیوایەتی كردووە وبە سەحیحی داناوە. جێی خۆیەتی كە فەرمانیان پێدەكا كە قسەی چاك لەگەڵ خەڵكی بكەن دوای ئەوە كە فەرمانیان پێئەدات چاكەیان لەگەلا بكەن بە كردار، هەردوولای بەیەكەوە بەستووە. واتە: داوایان لێدەكات بە كردارو بە گفتاریش هەڵسن بە چاكە كردن، پاشان خودای گەورە جەختیان لەسەر دەكاتەوە كە هەر ئەو بپەرستن و چاكەیش لەگەڵ خەڵكی بكەن. وە ئەفەرموێت: ﴿وَأَقِيمُوا۟ ٱلصَّلَوٰةَ وَءَاتُوا۟ ٱلزَّكَوٰةَ﴾ نوێژ بكەن و زەكات بدەن. پاشان ئاگاداریان دەكا كە ئەوان وازیان لەوانە هەموو هێنا خستیانە پشت گوێ. بەئەنقەست دژایەتیان كرد، دوای ئەوە كەخۆیان باش دەیان زانی مەگین كەمێكیان نەبێ. ئەفەرموێت: ﴿ثُمَّ تَوَلَّيْتُمْ﴾ لە دوای ئەوە كەمێك نەبێ پشتان تێكردوو خۆتان لە پەیمانەكە لادا. پاشان خودای گەورە ئەو فەرمانەشی دا بەسەر ئەم ئومەتە لە سوورەتی نیسائدا و ئەفەرموێت: ﴿وَٱعْبُدُوا۟ ٱللَّهَ وَلَا تُشْرِكُوا۟ بِهِۦ شَيْـًٔا ۖ وَبِٱلْوَٰلِدَيْنِ إِحْسَٰنًا وَبِذِى ٱلْقُرْبَىٰ وَٱلْيَتَٰمَىٰ وَٱلْمَسَٰكِينِ وَٱلْجَارِ ذِى ٱلْقُرْبَىٰ وَٱلْجَارِ ٱلْجُنُبِ وَٱلصَّاحِبِ بِٱلْجَنۢبِ وَٱبْنِ ٱلسَّبِيلِ وَمَا مَلَكَتْ أَيْمَٰنُكُمْ ۗ إِنَّ ٱللَّهَ لَا يُحِبُّ مَن كَانَ مُخْتَالًا فَخُورًا﴾[3] عەبدایەتی خوا بكەن و هیچ شتێ مەكەن بە شەریكی، دەربارەی دایك و باوك و خزمان و هەتیوان و هاوسێی دیوار بە دیوارو هاوسێی دوور و هاوەڵی هەمیشەییتان و ئەوانەی لە ڕێگەدا ماون و ئەوانەی بونەتە مولكتان تا دەتوانن چاكە بكەن، ئەوانەی لووت بەرز و خۆ پەسەندن خودا هیچ كامیانی خۆش ناوێ. ئەم ئومەتە هەڵسا بە جێبەجێكردنی ئەم فەرمانە كە هیچ ئومەتێ لە پێش ئەمدا بەم شێوەیە پێی هەڵنەساوە. سوپاس و ستایش بۆ خوای گەورە.

﴿وَإِذْ أَخَذْنَا مِيثَٰقَكُمْ لَا تَسْفِكُونَ دِمَآءَكُمْ وَلَا تُخْرِجُونَ أَنفُسَكُم مِّن دِيَٰرِكُمْ ثُمَّ أَقْرَرْتُمْ وَأَنتُمْ تَشْهَدُونَ ﴿٨٤﴾ ثُمَّ أَنتُمْ هَٰٓؤُلَآءِ تَقْتُلُونَ أَنفُسَكُمْ وَتُخْرِجُونَ فَرِيقًا مِّنكُم مِّن دِيَٰرِهِمْ تَظَٰهَرُونَ عَلَيْهِم بِٱلْإِثْمِ وَٱلْعُدْوَٰنِ وَإِن

---

[1] ابن ابی حاتم /١/٢٥٨.

[2] أحمد/٥/١٧٣،مسلم/٤/٢٠٢٦، تحفة الاحوذی/٥/٥٦٢.

[3] النساء ٣٦.

يَأْتُوكُمْ أُسَرَىٰ تُفَٰدُوهُمْ وَهُوَ مُحَرَّمٌ عَلَيْكُمْ إِخْرَاجُهُمْ ۚ أَفَتُؤْمِنُونَ بِبَعْضِ ٱلْكِتَٰبِ وَتَكْفُرُونَ بِبَعْضٍ ۚ فَمَا جَزَآءُ مَن يَفْعَلُ ذَٰلِكَ مِنكُمْ إِلَّا خِزْىٌ فِى ٱلْحَيَوٰةِ ٱلدُّنْيَا ۖ وَيَوْمَ ٱلْقِيَٰمَةِ يُرَدُّونَ إِلَىٰٓ أَشَدِّ ٱلْعَذَابِ ۗ وَمَا ٱللَّهُ بِغَٰفِلٍ عَمَّا تَعْمَلُونَ ﴿٨٥﴾ أُو۟لَٰٓئِكَ ٱلَّذِينَ ٱشْتَرَوُا۟ ٱلْحَيَوٰةَ ٱلدُّنْيَا بِٱلْءَاخِرَةِ ۖ فَلَا يُخَفَّفُ عَنْهُمُ ٱلْعَذَابُ وَلَا هُمْ يُنصَرُونَ ﴿٨٦﴾ ﴾

## بەندەكانی پەیمانەكە وە شكاندن و هەڵوەشانەوەی

خودای گەورە ئەفەرموێت: ﴿وَإِذْ أَخَذْنَا مِيثَٰقَكُمْ لَا تَسْفِكُونَ دِمَآءَكُمْ وَلَا تُخْرِجُونَ أَنفُسَكُم مِّن دِيَٰرِكُمْ ثُمَّ أَقْرَرْتُمْ وَأَنتُمْ تَشْهَدُونَ﴾ پەیمانمان لێتان وەرگرت كە: خوێنی یەكتر مەڕێژن و خۆتان هەر لە زێدی خۆتان وەدەر مەنێن، پاشان بۆ ئەوە بەڵێنتان داو خۆشتان شایەتی ئەدەن. خودای گەورە باسی خراپی ئەوجولەكانە ئەكا لەسەردەمی پێغەمبەری خوادا(ﷺ) لە مەدینەدا. ئەو گیرو گرفتانەی توشیان هات لە شەڕكردن لەگەڵ ئەوس و خەزرەجدا، كە ئەنساریەكان بوون. لە كاتی نەفامیدا بتیان ئەپەرست. شەڕی زۆر لە نێوانیاندا ڕوی دابوو. جوولەكەكانی مەدینە سێ هۆز بوون. بەنو قەینقاع و بەنو نەزیر، بنو قینقاع و بنو النضیر هاوپەیمانی خەزرەج بوون. وە بەنو قورەیزە هاوپەیمانی ئەوس بوون. كاتێ كە جەنگ ڕووی بدایە لە نێوانیاندا، هەر كۆمەڵەو لەگەڵ هاوپەیمانەكەیدا شەڕی دەكرد، جوولەكە دەچوو بە گژ دوژمنەكەیدا. جوولەكە لە جوولەكەی بەرەی تری دەكوشت، ئەوە لە ئاینەكەی ئەواندا حەرام كرابوو لێیان بە دەقی كتێبی خۆیان. وە لە زێدی خۆیان دەریان دەكردن و ماڵ و سامانەكانیان بە تالان دەبردن، بەڵام كاتێ كە شەڕ تەواو دەبوو، كۆیلەی ئەوانەی كە شكستیان هێنابوو بەرئەدا و ئازادیان ئەكردن و كاریان بە تەورات ئەكرد. هەر بۆیە خودای گەورە ئەفەرموێت: ﴿أَفَتُؤْمِنُونَ بِبَعْضِ ٱلْكِتَٰبِ وَتَكْفُرُونَ بِبَعْضٍ﴾ ئایا ئێوە بەهەندێ لە ناوەڕۆكی كتێبەكەتان بڕوا دەكەن. وە بۆیە ئەفەرموێت: ﴿وَإِذْ أَخَذْنَا مِيثَٰقَكُمْ لَا تَسْفِكُونَ دِمَآءَكُمْ وَلَا تُخْرِجُونَ أَنفُسَكُم مِّن دِيَٰرِكُمْ﴾ پەیمانمان لێیان وەرگرت كە: خوێنی یەكتر مەڕێژن و خۆتان لە زێدی خۆتان وەدەر مەنێن. وەك خودای گەورە ئەفەرموێت: ﴿فَتُوبُوٓا۟ إِلَىٰ بَارِئِكُمْ فَٱقْتُلُوٓا۟ أَنفُسَكُمْ ذَٰلِكُمْ خَيْرٌ لَّكُمْ عِندَ بَارِئِكُمْ فَتَابَ عَلَيْكُمْ﴾[1] پەشیمانی لەلای وەدی هێنەرتانەوە دەربڕن، سا وەرن یەكتر بكوژن، لای بەدی هێنەرتانەوە ئەم كارە بۆتان چاكترە. چونكە ئەهلی یەك میلەت وەك یەك گیان وایە. وەك پێغەمبەری خودا(ﷺ)

[1] البقرة ٥٤.

فەرمویەتی: نمونەی ئیمانداران لە خۆشەویستی بۆ یەکترو هاوسۆزی و بەزەیی بۆ یەکدا وەك یەك جەستە وان، ئەگەر ئەندامێکی ئازاری هەبوو ئەوا دەناڵێنێ لەتاو بێخەوی و گەرمە تا[1]. خودای گەورە ئەفەرموێت: ﴿ثُمَّ أَقْرَرْتُمْ وَأَنتُمْ تَشْهَدُونَ﴾ پاشان بڕیارتان لەسەر ئەو پەیمانە داو خۆشتان شایەتی ئەدەن لەسەر ڕاستیەکەی. پاشان خوای گەورە ئەفەرموێت: ﴿ثُمَّ أَنتُمْ هَٰؤُلَاءِ تَقْتُلُونَ أَنفُسَكُمْ وَتُخْرِجُونَ فَرِيقًا مِّنكُم مِّن دِيَارِهِمْ﴾ لە دوای ئەوەیش هەر خۆتان بوون کوشتارتان لە یەکتر دەکردبە پشتیوانی خەڵکی تریە تاوان و دەستدرێژی هەندێ کە هەر لە خۆتانن، لە وڵاتیان وەدەر دەنێن. کە لێشتان بە دیل دەگیرێ، هەموتان خوێنەکەی ئەدەن، کە هیچ بۆتان ڕەوا نیە دەریان بکەن. موحەمەدی کوڕی ئیسحاق کوڕی یەسار ڕیوایەتی کردووە لە ئیبنو عەباسەوە: ﴿ثُمَّ أَنتُمْ هَٰؤُلَاءِ تَقْتُلُونَ أَنفُسَكُمْ وَتُخْرِجُونَ فَرِيقًا مِّنكُم مِّن دِيَارِهِمْ﴾ لە دوای ئەوەش هەر خۆتان بوون کوشتارتان لە یەکتر دەکرد، بە پشتیوانی خەڵکی تر بە تاوان و دەستدرێژی هەندێ کە هەر لە خۆتانن لە وڵاتیان وەدەر دەنێن. وتی: خودا بەو جۆرە ئاگاداری کردن لە ئاکارەکانیان. لە تەوراتا خوێن ڕێژی یەکتری لێ حەرام کردبوون و ئازاد کردنی دیلەکانی لەسەر فەرز کردبوون ئەوان دوو دەستە بوون، کۆمەڵێ لە وانە هاوپەیمانی خەزرەجیەکان بوون کە بەنو قەینقاعە. بەنو نەزیر و قورەیزیش هاوپەیمانی ئەوس بوون. ئەو جولەکانە کاتێ کە جەنگ ڕووی بدایە لە نێوان ئەوس و خەزرەج، بەنو قەینقاع لەگەڵ خەزرەجیەکان دەردەچوون، بەنو نەزیرو قورەیزیش لەگەڵ ئەوسیەکان دەردەچوون. هەریەکەیان هاوکاری هاوپەیمانەکەی خۆی دەکرد لە دژی براکانی خۆی، تا ئەوەبوو خوێنی یەکتریان دەڕێژا. تەوراتیش لەبەر دەستیاندا بوو، دەیانزانی چی تیایە دەربارەیان بیکەن و چیشی تێدایە لێیان قەدەغە کراوە، ئەوس و خەزرەج بتپەرست بوون. نەیان دەزانی ئاگرو بەهەشت و زیندوبوونەوە و کتێب و حەڵاڵ و حەرام چیە. کاتێ کە جەنگ کۆتایی دەهات. دیلەکانیان ڕزگار دەکرد بە پێی ئەو فەرمانەی لە تەوراتا هاتبوو، لە یەکتریان وەردەگرت. بەنو قەینقاع فیدیەی ئەو دیلانەیان ئەدا کە لای ئەوسیەکان بوون. بەنو نەزیرو قورەیزیش فیدیەی ئەوانەیان ئەداکە لەلای خەزرەجیەکان بوو. وە دوای خوێنی ئەوانەیان دەکرد کە لە نێوانیاندا کوژرابوون، ئەوانەیان لە یەکتری دەکوژرا لەسەر هاوکاری ئەو بتپەرستانە. هەربۆیە خودای مەزن لەوە ئاگاداریان دەکاتەوەو ئەفەرموێت: ﴿أَفَتُؤْمِنُونَ بِبَعْضِ الْكِتَابِ وَتَكْفُرُونَ بِبَعْضٍ﴾ ئایا ئێوە بەهەندێ بە ناوەڕۆکی کتێبەکەتان بڕوا دەکەن و لە هەندێکی حاشادەکەن. واتە: بە فەرمانی تەورات فیدیەیان بۆ ئەدەن و دەشیان کوژن، لە فەرمانی

[1] مسلم /١٩٩٩/٤.

تەوراتا هاتووەکە نابێ بکوژرێن و لە زێدی خۆیان دەربکرێن. وە نابێ هاوکاری بتپەرستان بکەن لە دژیان لەبەر هەندێ سامانو ماڵی دنیا، لەسەر ئەو کارەیان لەگەڵ ئەوس و خەزرەجدا کردیان، ئەم بەسەرهاتە هاتۆتە خوارەوە وەك هەواڵم پێدراوە[1]. لەوەی ئەم ئایەتە ئاماژەی پێدەکا و ئەو بەسەرهاتەش باسی خراپی جوولەکە دەکا، لە هەڵسانیان بە فەرمانی تەورات لەوەی کە خۆیان بە ڕاست دەزانن و دژی پەیڕەوی تەوراتە، خۆشیان چاك دەزانن و شایەتیان داوە کە ڕاستە. لەبەر ئەوە متمانەیان پێناکرێ بەوەی کە تیایەتی و بەوەش کە گێڕاویانەتەوە. وە بڕواشیان پێناکرێ دەربارەی ئەوەی کە شاردویانەتەوە لە سیفەتی پێغەمبەری خودا و(ﷺ) ڕەوانە کردنی و شوێنی دەرچونی و کۆچ کردن و ئەوشتانەی تریش کە پێغەمبەران سەلامی خوایان لێبێ لە پێشا باسیان کردووە. جوولەکە بەرنەفرینی خودا کەون لە نێوان خۆیاندا دەیان شاردەوە. هەر بۆیە خودای گەورە ئەفەرموێت: ﴿فَمَا جَزَآءُ مَن يَفۡعَلُ ذَٰلِكَ مِنكُمۡ إِلَّا خِزۡيٞ فِي ٱلۡحَيَوٰةِ ٱلدُّنۡيَا﴾ هەرکەس لە ئێوە ئەوە بکا لە ژیانی دونیا ڕیسوا دەبێ بەهۆی دژایەتی کردنیان لە فەرمان و شەرعی خودا ﴿وَيَوۡمَ ٱلۡقِيَٰمَةِ يُرَدُّونَ إِلَىٰٓ أَشَدِّ ٱلۡعَذَابِ﴾ لە ڕۆژی قیامەتیشدا زۆر بە توندی سزا ئەدرێ بەهۆی سەرپێچی ئەو کتێبەی خودا کە لەبەر دەستیان بوو ﴿وَمَا ٱللَّهُ بِغَٰفِلٍ عَمَّا تَعۡمَلُونَ﴾ خودا بێئاگا نیە لەوەی کە دەیکەن. پاشان خودای گەورە ئەفەرموێت: ﴿أُوْلَٰٓئِكَ ٱلَّذِينَ ٱشۡتَرَوُاْ ٱلۡحَيَوٰةَ ٱلدُّنۡيَا بِٱلۡأٓخِرَةِ﴾ ئەو کەسانەی ژیانی دنیایان کڕیوە قیامەتیان لە نرخی داوە ﴿فَلَا يُخَفَّفُ عَنۡهُمُ ٱلۡعَذَابُ﴾ ئیتر نە باری ئازاریان سووك دەکرێ و ﴿وَلَا هُمۡ يُنصَرُونَ﴾ نە کەسیش یارمەتیان ئەدات. واتە: ئەوانەی کە ژیانی دنیایان پێخۆشترە و لە جێی قیامەت هەڵیان بژاردووە، تەنیا ساتێك ئازاریان لەسەر سووك ناکرێ، کەسیش نیە بەهانایانەوە بێت و لەو سزایە دەریان بێنێ و ڕزگاریان بکا کە بەردەوام و تاهەتایە تێیدا دەمێننەوە.

﴿وَلَقَدۡ ءَاتَيۡنَا مُوسَى ٱلۡكِتَٰبَ وَقَفَّيۡنَا مِنۢ بَعۡدِهِۦ بِٱلرُّسُلِۖ وَءَاتَيۡنَا عِيسَى ٱبۡنَ مَرۡيَمَ ٱلۡبَيِّنَٰتِ وَأَيَّدۡنَٰهُ بِرُوحِ ٱلۡقُدُسِۗ أَفَكُلَّمَا جَآءَكُمۡ رَسُولُۢ بِمَا لَا تَهۡوَىٰٓ أَنفُسُكُمُ ٱسۡتَكۡبَرۡتُمۡ فَفَرِيقٗا كَذَّبۡتُمۡ وَفَرِيقٗا تَقۡتُلُونَ ﴿٨٧﴾﴾

**خۆبەزل زانی جوولەکە و بەدرۆخستنەوەی پێغەمبەران و کوشتنیان**

خودای گەورە ئەفەرموێت: ﴿وَلَقَدۡ ءَاتَيۡنَا مُوسَى ٱلۡكِتَٰبَ وَقَفَّيۡنَا مِنۢ بَعۡدِهِۦ بِٱلرُّسُلِۖ وَءَاتَيۡنَا عِيسَى ٱبۡنَ مَرۡيَمَ ٱلۡبَيِّنَٰتِ وَأَيَّدۡنَٰهُ بِرُوحِ ٱلۡقُدُسِۗ أَفَكُلَّمَا جَآءَكُمۡ رَسُولُۢ بِمَا لَا تَهۡوَىٰٓ أَنفُسُكُمُ ٱسۡتَكۡبَرۡتُمۡ فَفَرِيقٗا كَذَّبۡتُمۡ وَفَرِيقٗا

---

[1] ابن ابی حاتم /۱/۲٦۳ ص۷٦.

تَقْتُلُونَ ﴾ ئێمە خۆمان کتێبمان داوە بەموسا و پێغەمبەری تریشمان لە دوای ئەو نارد، چەند بەڵگەی زۆر ئاشکرامانداوە بە عیسای کوڕی مریەم، وە پشتیوانیشمان کرد بە جوبرەئیل، تا ئێستا هەر پێغەمبەرێکتان بۆ هات، شتی وای وت کی ئێوە پێتان خۆش نەبوو، خۆتان لەوە بەزلتر زانی و بە هەندێکیانتان وت درۆزن و هەندێکیشتان کوشت. خودای مەزن وەسفی نەوەی ئیسرائیل دەکا بە لاسارو بێگوێ و دژایەتی کردن و خۆ بەزلزان بەرامبەر بە پێغەمبەرەکانیان و هەمیشە شوێن ئارەزوی خۆیان کەوتون، خودای مەزن باسی ئەوە دەکا کە موسای ڕەوانە کرد بۆیان و کتێبی تەوراتی پێدا، کەچی ئەوان دەستکاریان کردو گۆڕیان. سەرپێچی فەرمانەکانی تەوراتیان کرد. دوای ئەوە پێغەمبەرانی بۆ ناردن تا پەیڕەوی شەریعەتەکەی بکەن وەك دەفەرموێت: ﴿ إِنَّآ أَنزَلْنَا ٱلتَّوْرَىٰةَ فِيهَا هُدًى وَنُورٌ يَحْكُمُ بِهَا ٱلنَّبِيُّونَ ٱلَّذِينَ أَسْلَمُوا۟ لِلَّذِينَ هَادُوا۟ وَٱلرَّبَّـٰنِيُّونَ وَٱلْأَحْبَارُ بِمَا ٱسْتُحْفِظُوا۟ مِن كِتَـٰبِ ٱللَّهِ وَكَانُوا۟ عَلَيْهِ شُهَدَآءَ ﴾[1] ئێمە ئەم تەوراتەمان ناردۆتە خوار، ڕوناکی و ڕێ نیشاندەری تێدایە. هەموو ئەو پێغەمبەرانەی کە هەر بە فەرمانی خودا بوون، هەر بە هۆی ئەمە، بەسەر هەموو کارو باری ئەوانەی کە مووسایی بوون ڕاگەشتوون. خودا ئەناسی بەڕاستی و زانا بلیمەتەکانیان زۆر شتیان هەر لە کتێبی خودا لەبەر بوو. بە تەوراتیش ئاگادار بوون کە ئەمە کتێبی خودایە. هەر بۆیە خودای مەزن ئەفەرموێت: ﴿وَقَفَّيْنَا مِنۢ بَعْدِهِۦ بِٱلرُّسُلِ﴾ چەند پێغەمبەری تریشمان لە دوای ئەو نارد. سوددی ئەڵێت: ﴿وَقَفَّيْنَا﴾ ناردمان[2]. کەسانی تریش ئەڵێن: دوا بدوای ئەو پێغەمبەری تریشمان نارد. هەموو ماناکان لەیەکەوە نزیکن. وەك خودای گەورەش ئەفەرموێت: ﴿ثُمَّ أَرْسَلْنَا رُسُلَنَا تَتْرَا﴾[3] لەپاشان پێغەمبەرانی خۆمان یەك لە دوای یەك نارد. تا کۆتایی پێغەمبەرانی نەوەی ئیسرائیل هات بە عیسای کوڕی مریەم. لە هەندێ بڕیاری تەوراتدا ئەو جیاوازی هەبوو. هەر بۆیە خودای گەورە هەندێ نیشانەی ئاشکرای پێدا بوو کە بریتی بوون لە موعجیزە. ئیبنو عەباس ئەڵێت: لە زیندوکردنەوەی مردوو، وە دروستکردنی شێوەی باڵندە لە قوڕو فوی پیا دەکرد و بە ئیزنی خودا دەفڕی، نەخۆشی چاك دەکردەوە و هەواڵی لە شتی نەدیار ئەدا[4]. جوبرەئیلیش پشتگیری لێدەکرد لەسەر ڕاستی ئەو پەیامەی کە بۆی هێناون، نەوەی ئیسرائیل زۆر بە توندی بەرەنگاری بوونەوە و باوەڕیان پێنەدەکرد وئیرەییان

---

[1] المائدة ٤٤.

[2] ابن ابی حاتم /٢٦٨/١ ص٧٦.

[3] المؤمنون ٤٤.

[4] ابن ابی حاتم /١٦٨/١ ص٧٧.

پێدەبرد و سەرپێچیان لە هەندێ بڕیاری تەورات دەکرد، وەك خودای گەورە لەبارەی عیساوە سەلامی خوای لێبێ ئەفەرموێت: ﴿وَلِأُحِلَّ لَكُم بَعْضَ ٱلَّذِى حُرِّمَ عَلَيْكُمْ ۚ وَجِئْتُكُم بِـَٔايَةٍ مِّن رَّبِّكُمْ﴾[1] بە ئەركی خۆمی دەزانم هەندێ شتتان بۆ حەلاڵ كەم كە لێتان حەرام كراوە، من نیشانەم لە پەروەردگارتانەوە بۆ هێناون. ئەوەی ئیسرائیل هەڵسوكەوتیان لەگەڵ پێغەمبەراندا زۆر خراپ بووە بڕوایان بە هەندێكیان نەدەكرد و هەندێكیشیان دەكوشتن. ئەمەیش هەر لەسەر ئەوە بوو كە هەندێ شتیان پێڕادەگەیاندن دژی هەواو ئارەزوی ئەوان بوو. فەرمانیشیان پێئەدان كە پابەند بن بە فەرمانەكانی تەوراتەوە كە دژی دەجولانەوە. ئەوانیش ئەوەیان زۆر بەلاوە گران بوو لەبەر ئەوە بڕوایان بە پێغەمبەرەكان نەدەهێنا و بە درۆیان دەخستنەوە و هەندێكیشیان دەكوشتن. بۆیە خودای گەورە ئەفەرموێت: ﴿أَفَكُلَّمَا جَآءَكُمْ رَسُولٌۢ بِمَا لَا تَهْوَىٰٓ أَنفُسُكُمُ ٱسْتَكْبَرْتُمْ فَفَرِيقًا كَذَّبْتُمْ وَفَرِيقًا تَقْتُلُونَ﴾ تا ئێستا هەر پێغەمبەرێكتان بۆ هاتبێ شتی وای وتبێ كە ئێوە پێتان خۆش نەبووبێ، خۆتان لەو بەزلتر زانیوە، بە هەندێكتان وتووە درۆزنە وهەندێكیشیانتان هەر كوشتوون.

## روح القدوس جوبرەئیلە

بەڵگە لەسەر ئەوە كە (الروح القدوس) جوبرەئیلە وەكو ئیبنو عەباس لە تەفسیری ئەم ئایەتەدا ئەڵێت[2]. ئیبنو عەباس و موحەمەدی كوڕی كەعب و ئیسماعیلی كوڕی خالید و سوددی و ڕەبیعی كوڕی ئەنەس و عەتیەی عەوفی و قەتادەش بە دوای ئەوەدا هەروایان وتووە[3]. لەگەڵ ئەم ئایەتەیشا كە خوای گەورە ئەفەرموێت: ﴿نَزَلَ بِهِ ٱلرُّوحُ ٱلْأَمِينُ ﴿١٩٣﴾ عَلَىٰ قَلْبِكَ لِتَكُونَ مِنَ ٱلْمُنذِرِينَ﴾[4] الروح الامین هێناویەتیە خوار، بۆ سەر دڵت تا تۆ لە ترسێنەران بی. بوخاری ڕیوایەتی كردووە لە عائیشەوە كە پێغەمبەری خودا(ﷺ) مینبەرێكی بۆ حەسانی كوڕی سابت لە مزگەوتا دروست كردبوو، كە بەرگری لە پێغەمبەری خودا دەكرد(ﷺ) و پێغەمبەری خودا(ﷺ) فەرمویەتی: ئەی خودایە! یارمەتی حەسان بدەبە (الروح القدس) وەك چۆن ئەو بەرگری لە پێغەمبەرەكەت كرد[5]. ئەبو داود لە سونەنەكەیدا ڕیوایەتی كردووە[6]. تیرمزیش هەر ڕیوایەتی كردووە[7]. وتی فەرمودەیەكی حەسەنی سەحیحە لە

[1] ال عمران ٥٠.
[2] ابن ابی حاتم /١/٢٦٩ ص٧٧.
[3] ابن ابی حاتم /١/٢٧٠.
[4] الشعراء ١٩٣-١٩٤.
[5] فتح الباری /١٠/٥٦٢.
[6] أبو داود /٥/٢٧٩.
[7] تحفة الاحوذی /٨/١٣٧.

سەحیحی ئیبنو حەبانیشا هاتووە لە ئیبنو مەسعودەوە کە پێغەمبەری خودا فەرمویەتی: جوبرەئیل خۆی کرد بە ناخمداپێی ڕاگەیاندم کە هیچ گیانێ نامرێ تا ڕۆزی و ماوەی تەمەنی تەواو نەکا، لە خوا بترسن و بە جوانی بە دوایدا بگەڕێن[1].

**بەردەوامی جوولەکە لەسەر کوشتنی پێغەمبەران سەلامی خوایان لێبێ**

زەمەخشەری دەڵێت: لەم دەقەدا کەخودای گەورە ئەفەرموێت: ﴿فَفَرِيقًا كَذَّبْتُمْ وَفَرِيقًا تَقْتُلُونَ﴾ بە هەندێکیان وت: درۆزن و هەندێکشتان هەر کوشتوون. بۆیە خودای گەورە نەیفەرمووە: (و فريقا قتلتم) دیارە خودا ویستویەتی وەسفیان بەوە بکا لە داهاتویشا، چونکە ئەوان هەوڵی کوشتنی پێغەمبەریشیان دا بە ژەهرو جادوو، پێغەمبەری خودا (ﷺ) لە نەخۆشی کۆچی دوایی کردنیدا فەرموی: بەردەوام خواردنەکەی خەیبەر ئێشم پێدەگەیەنێ(تعاودنى) ئەمە کاتی پچرانی دەماری پشتمە(أوان أنقطاع أبهرى)[2]. منیش دەڵێم: ئەم فەرمودە لە سەحیحی بوخاری و شوێنی تریشا هاتووە[3].

﴿وَقَالُوا قُلُوبُنَا غُلْفٌ بَل لَّعَنَهُمُ اللَّهُ بِكُفْرِهِمْ فَقَلِيلًا مَّا يُؤْمِنُونَ (٨٨)﴾

خودای گەورە ئەفەرموێت: ﴿وَقَالُوا قُلُوبُنَا غُلْفٌ بَل لَّعَنَهُمُ اللَّهُ بِكُفْرِهِمْ فَقَلِيلًا مَّا يُؤْمِنُونَ﴾ وتیان: دڵمان سەرپۆشی پێدا دراوە، نەخێر، ئەوان بەهۆی لە خوا لادانیان بەر نەفرینی خودا کەوتون و بە دەگمەن بروا دەکەن. موحەمەدی کوری ئیسحاق ڕیوایەتی کردووە لە ئیبنو عەباسەوە: ﴿وَقَالُوا قُلُوبُنَا غُلْفٌ﴾ وتیان: دڵمان لەناو چەند پەردەیەکدایە. موجاهیدئەڵێت: ﴿وَقَالُوا قُلُوبُنَا غُلْفٌ﴾ وتیان: دڵمان پەردەی لەسەرە. عیکرەمە وتی: مۆری لەسەرە. ئەبولعالیە ئەڵێت: واتە: تێناگا. موجاهید و قەتادە ئەڵێن: ئیبنو عەباس بە ﴿غُلُفٌ﴾ خوێندویەتیەوە. بەزمی لامەکە (اللام) کە جەمعی (غلاف). واتە: دڵمان دەفرو قاپی هەموو شتێکە، پێویستمان بە زانیاری تۆ نیە. ئیبنو عەباس و عەتا ئەڵێن: ﴿بَل لَّعَنَهُمُ اللَّهُ بِكُفْرِهِمْ﴾ ئەوانە بەهۆی لە خوا لادانیان بەر نەفرینی خودا کەوتن. واتە: خودا دەری کردن و دوری خستنەوە لە هەموو چاکەیەك: ﴿فَقَلِيلًا مَّا يُؤْمِنُونَ﴾ بە دەگمەن بروا دەکەن. قەتادەئەڵێت: کەمێکیان نەبێ باوەڕ نامێنن: ﴿وَقَالُوا قُلُوبُنَا غُلْفٌ﴾ وتیان: دڵمان سەرپۆشی پێدا دراوە. ئەم ئایەتە وەك ئەو

---

[1] السنة /١٤/٣٠٤ فەرموودەیەکی حەسەنی سەحیحە.

[2] ابن عدى /١٢٣٩/٣/،حاكم و زەهەبی بە سەحیحیان داناوە. أبهر: دەمارێکە لە پشتا پەیوەستە بە دڵەوە.

[3] الفتح البارى /٧٣٧/٧.

ئایەتە وایە کە خودای گەورە دەفەرموێت: ﴿وَقَالُوا قُلُوبُنَا فِي أَكِنَّةٍ مِمَّا تَدْعُونَا إِلَيْهِ﴾[1] وتیان: لەوەی کە تۆ ئێمەی بۆ بانگ دەکەی، دڵمان پۆششی لەسەرە. هەر بۆیە خودای گەورە ئەفەرموێت: ﴿بَل لَّعَنَهُمُ اللَّهُ بِكُفْرِهِمْ فَقَلِيلًا مَّا يُؤْمِنُونَ﴾ نەخێر، ئەوان بە هۆی خوانەناسیان بەر نەفرینی خودا کەوتن. واتە: بەو جۆرە نیە کە ئەوان دەڵێن، بەڵکو دڵەکانیان بەر نەفرینی خودا کەوتووەو مۆر کراوە. وەك لە سوورەتی نسائدا خوای گەورە ئەفەرموێت: ﴿وَقَوْلِهِمْ قُلُوبُنَا غُلْفٌ ۚ بَلْ طَبَعَ اللَّهُ عَلَيْهَا بِكُفْرِهِمْ فَلَا يُؤْمِنُونَ إِلَّا قَلِيلًا﴾[2] وە وتیان: ئێمە دڵمان داخراوە (بەر نەفرینی خۆمان خستن) هەر خودا خۆی دڵی بە مۆر داخستوون. ئیتر بەشی کەمیان نەبێ، لە باوەڕ هێنان بێبەشن. زانایان ڕای جیاوازیان هەیە لەمانای: ﴿فَقَلِيلًا مَّا يُؤْمِنُونَ﴾ وە لەم دەقەیشا کە ئەفەرموێت: ﴿فَلَا يُؤْمِنُونَ إِلَّا قَلِيلًا﴾ هەندێکیان دەڵێن: کەمێ لەوانە بڕوا دەهێنن. هەندێکی تر دەڵێن: بڕواکەیان کەمە، یانی: ئەوان بڕوایان هەیە بەوەی کە مووسا بۆی هێناون دەربارەی ڕۆژی قیامەت و پاداشت و تۆڵە. بەڵام ئەو بڕوایە هیچ سودێکی نیە بۆیان، چونکە ئەوانە دڵیان پڕە لە بێباوەڕی لەوەی کە موحەمەد(ﷺ) پێی ڕەوانە کراوە. هەندێکی تر دەڵێن: بێگومان ئەوانە بڕوایان بە هیچ شتێك نەبووە. کە خودای گەورە ئەفەرموێت: ﴿فَقَلِيلًا مَّا يُؤْمِنُونَ﴾ ئەوانە بە کۆمەڵی و بەیەکەوە خوانەناسن. وەك عەرەب دەڵێ: (فما رایت مثل هذا قط) واتە: وێنەی ئەوەم هەرگیز نەدیوەر.

﴿وَلَمَّا جَاءَهُمْ كِتَابٌ مِّنْ عِندِ اللَّهِ مُصَدِّقٌ لِّمَا مَعَهُمْ وَكَانُوا مِن قَبْلُ يَسْتَفْتِحُونَ عَلَى الَّذِينَ كَفَرُوا فَلَمَّا جَاءَهُم مَّا عَرَفُوا كَفَرُوا بِهِ ۚ فَلَعْنَةُ اللَّهِ عَلَى الْكَافِرِينَ ﴿٨٩﴾﴾

**جوولەکە چاوەڕوانی هاتنی پێغەمبەریان دەکرد(ﷺ) کاتێ کە ڕەوانە کرا بڕوایان پێنەکرد**

خودای گەورە ئەفەرموێت: ﴿وَلَمَّا جَاءَهُمْ كِتَابٌ مِّنْ عِندِ اللَّهِ مُصَدِّقٌ لِّمَا مَعَهُمْ وَكَانُوا مِن قَبْلُ يَسْتَفْتِحُونَ عَلَى الَّذِينَ كَفَرُوا فَلَمَّا جَاءَهُم مَّا عَرَفُوا كَفَرُوا بِهِ ۚ فَلَعْنَةُ اللَّهِ عَلَى الْكَافِرِينَ﴾ کاتێ کتێبێکتان کە قورئانە لەلایەن خوداوە بۆدێ، ئەو کتێبەش کە تەوراتە دەیسەلمێنێ کە ئێستا لای ئەوانە، ئەوانە لە پێشا دەیان ویست بەسەر خوانەناساندا زاڵیان بکا، کەچی وەختێ هات و ناسیان، بێبڕوابوون پێی، دەسا نەفرینی خودا لە بێبڕوایان بێ. خودای مەزن ئەفەرموێت: ﴿وَلَمَّا جَاءَهُمْ﴾ کاتێ

---

[1] فصلت ٥.

[2] النساء ١٥٥.

کە جوولەکەکان ئەو قورئانەیان بۆ هات ﴿كِتَٰبٌ مِّنْ عِندِ ٱللَّهِ﴾ کە ڕەوانە کرا بۆ موحەمەد(ﷺ) ﴿مُصَدِّقٌ لِّمَا مَعَهُمْ﴾ پشتیوانی لەو کتێبەش کرد کە تەوراتە کە لەلای ئەوانە: ﴿وَكَانُوا۟ مِن قَبْلُ يَسْتَفْتِحُونَ عَلَى ٱلَّذِينَ كَفَرُوا۟﴾ لە پێشا ئەوان دەیان ویست بەسەر خوانەناساندا زاڵیان کا. واتە: ئەوان لە پێش هاتنی ئەم پێغەمبەرە بەم قورئانەوە، دەیان ویست بە هاتنی سەریان بخات بەسەر دوژمنەکانیاندا لە بتپەرستان ئەگەر شەڕیان لەگەڵا کردن، دەیان ووت: بەم زوانە دواین پێغەمبەر دێت لەگەڵی دژی ئێوە شەڕ دەکەین وەك شەڕ دژی عاد و ئیرەم. موحەمەدی کوڕی ئیسحاق ڕیوایەتی کردووە لە ئیبنو عەباسەوە‌ئەڵێت: جوولەکە داوای زاڵ بونیان لە خودا دەکرد بەسەر ئەوس و خەزرەجدا بە هاتنی پێغەمبەر(ﷺ) لە پێش هاتنیا. کاتێ کە خودا ڕەوانەی کرد لەناو عەرەبدابڕوایان پێنەهێنا و دانیان بەوەدا نەنا کە دەسان وت دەربارەی. مەعازی کوڕی جەبەل و بشیری کوڕی بەرائی کوڕی مەعرور برای بەنی سەلەمە ئەڵێن: ئەی کۆمەڵی جوولەکە! لە خوا بترسن و مسوڵمان بن، ئەوسا ئێوە داواتان لە خودا دەکرد کە موحەمەد(ﷺ) ڕەوانە بکا ئێمە بتپەرست بووین، کاتێ ئێوە هەواڵتان پێنەداین کە دێت سیفەتەکانیتان باس دەکرد. سەلامی کوڕی میشکەم برای بنی نضیر وتی: هیچ شتێکمان بۆ نەهاتووە کە پێمان ناسیبێ، ئەمە ئەوە نیە کە ئێمە بۆمان باس کردون. خودای مەزن ئەم ئایەتەی دەربارەی ئەو قسەی ئەوان نارده خوارەوە: ﴿وَلَمَّا جَآءَهُمْ كِتَٰبٌ مِّنْ عِندِ ٱللَّهِ مُصَدِّقٌ لِّمَا مَعَهُمْ﴾[1] هەرکاتێ کتێبێکیان لەلایەن خوداوە بۆ دێ و ئەو کتێبەش دەسەلمێنێ کە ئێستا لەلای ئەوانە واتە: بڕواشی بە تەورات هەیە. ئەبولعالیە ئەڵێت: جوولەکەکان داوای هاتنی موحەمەدیان دەکرد(ﷺ) لە خودا، بۆ ئەوەی زاڵیان بکا بەسەر بتپەرستەکانی عەرەبا و دەیان وت: ئەی خودایە! ئەو پێغەمبەرە بنێرە کە ئێمە دەبینین لەلای ئێمە نوسراوە تا سزای بتپەرستەکان بدەین و بیان کوژین. کاتێ کە خودا موحەمەدی (ﷺ) ڕەوانەکرد، زانیان لە خۆیان نیە بڕوایان پێنەکرد وئیرەییان بە عەرەب برد. ئەوان چاك دەیانزانی کە پێغەمبەری خودایە. ب بۆیە خودای گەورەئەفەرموێت: ﴿فَلَمَّا جَآءَهُم مَّا عَرَفُوا۟ كَفَرُوا۟ بِهِۦ ۚ فَلَعْنَةُ ٱللَّهِ عَلَى ٱلْكَٰفِرِينَ﴾ کەچی کاتێ بۆیان هات و ناسیان. بڕوایان پێنەکرد. دەسا کەسانێ کە بڕوای پێناکەن بەرنەفرینی خوا کەون[2].

---

[1] الطبری /٢/٣٣٣ ص٧٨.

[2] ابن ابی حاتم /٢٧٦/١.

﴿بِئۡسَمَا ٱشۡتَرَوۡاْ بِهِۦٓ أَنفُسَهُمۡ أَن يَكۡفُرُواْ بِمَآ أَنزَلَ ٱللَّهُ بَغۡيًا أَن يُنَزِّلَ ٱللَّهُ مِن فَضۡلِهِۦ عَلَىٰ مَن يَشَآءُ مِنۡ عِبَادِهِۦۖ فَبَآءُو بِغَضَبٍ عَلَىٰ غَضَبٖۚ وَلِلۡكَٰفِرِينَ عَذَابٞ مُّهِينٞ ٩٠﴾

خودای گەورە ئەفەرموێت: ﴿بِئۡسَمَا ٱشۡتَرَوۡاْ بِهِۦٓ أَنفُسَهُمۡ أَن يَكۡفُرُواْ بِمَآ أَنزَلَ ٱللَّهُ بَغۡيًا أَن يُنَزِّلَ ٱللَّهُ مِن فَضۡلِهِۦ عَلَىٰ مَن يَشَآءُ مِنۡ عِبَادِهِۦۖ فَبَآءُو بِغَضَبٍ عَلَىٰ غَضَبٖۚ وَلِلۡكَٰفِرِينَ عَذَابٞ مُّهِينٞ﴾ ئای کە خۆیان بە نرخێکی خراپ فرۆشت، کە حاشا کردنیان بوو بەو قورئانەی خودا ناردیە خوارەوە، بەهۆی ئیرەییانەوە بوو بەوەی کە خودا لە بەخششی خۆی برێژێ بەسەر هەرکەسێکدا کە خۆی حەزیکا لە بەندەکانی کە موحەمەد(ﷺ) بەم کارەیان دووجار وەبەر غەزەبی کەوتن، ئەو بێبڕوایانە ئازارێکی ئابڕووبەریان دەبێ. موجاهید ئەڵێت: ﴿بِئۡسَمَا ٱشۡتَرَوۡاْ بِهِۦٓ أَنفُسَهُمۡ﴾ جوولەکە هەقیان فرۆشت بەبەتاڵ و شاردنەوەی ئەوەی موحەمەد (ﷺ) پێی هات کە دەبوایە ئاشکرایان بکردایە[1]. سوددی ئەڵێت: ﴿بِئۡسَمَا ٱشۡتَرَوۡاْ بِهِۦٓ أَنفُسَهُمۡ﴾ ئەفەرموێت: شێکی زۆر خراب بوو خۆیان پێفرۆشت[2]. واتە: شیتێکی زۆر خراپ بوو خۆیان پێفرۆشت، پێی ڕازی بوون ولا یان دا و حاشایان کرد لەوەی کە خودا ناردی بۆ موحەمەد(ﷺ) لە بڕوا پێکردن و پشتیوانی لێکردن و یارمەتی دانی، ئەوەیش کە پاڵی پێوە نان بریتی بوو لە حەسوودی و لاساری و ڕق و کینە: ﴿أَن يُنَزِّلَ ٱللَّهُ مِن فَضۡلِهِۦ عَلَىٰ مَن يَشَآءُ مِنۡ عِبَادِهِۦ﴾ بەوەی خودا بەخششی خۆی برێژێ بەسەر هەر کەسێکدا کە خۆی حەز بکا لە بەندەکانی. هیچ حەسودیەك لەوە گەورەتر نیە،﴿فَبَآءُو بِغَضَبٍ عَلَىٰ غَضَبٖ﴾ بەم کارەیان دووجار بەر غەزەب کەوتن. ئیبنو عەباس ئەڵێت: دووجار بەر غەزەب کەوتن: غەزەبێکیان لەبەر ئەوە بوو ئەوەی لەلایان بوو لە تەورات لەدەستیان داو کاریان پێنەکرد. غەزەبەکەی تریش کە توشیان هات بەهۆی بڕوا نەکردنیان بوو بەم پێغەمبەرە(ﷺ) کە خودا بۆی ناردن[3]. منیش دەڵێم: ﴿فَبَآءُو﴾ یانی: دووجار وەبەر غەزەب کەوتن و پێویست کراو چەسپا بەسەریاندا. ئەبولعالیە ئەڵێت: خودا بەر غەزەبی خستن لەبەر ئەوە کە بڕوایان بە ئینجیل و عیسا نەکرد، دیسان بەر غەزەبی خودا کەوتن لەبەر ئەوە کە بڕوایان بە قورئان و موحەمەدیش(ﷺ) نەکرد[4]. عیکرەمەو قەتادەیش هەروایان وتووە[5]. پاشان خودای گەورە ئەفەرموێت:

---

[1] الطبری /٢/٣٤٠ ص٧٨.
[2] ابن ابی حاتم /١/٢٧٧.
[3] ابن ابی حاتم /١/٢٧٩.
[4] ابن ابی حاتم /١/٢٧٨.
[5] ابن ابی حاتم /١/٢٧٩.

﴿وَلِلْكَٰفِرِينَ عَذَابٌ مُّهِينٌ﴾ بۆ خوانەناسان ئازارێكی ئابڕو بەر دەبێ. هۆی خوانەناسیەكەیان ستەم و حەسودی بوو، بنەڕەتی ئەوەیش خۆبەزل زانینە، هەر بۆیە توشی ئەو سەرشۆڕی و بچوكی و ئابڕوچونە هاتن لە دنیا و لە قیامەتا. وەك خودای گەورە ئەفەرموێت: ﴿إِنَّ ٱلَّذِينَ يَسْتَكْبِرُونَ عَنْ عِبَادَتِي سَيَدْخُلُونَ جَهَنَّمَ دَاخِرِينَ﴾[1] ئەو كەسانەی هەر لەبەر خۆبەزل زانین نایانەوێ بم پەرستن بە زەبوونی دەچنە ناو جەهەنەمەوە. واتە: بەسەر شۆڕی و زەلیلی و بچوكی و ئابڕۆچونەوە دەچنە ناو جەهەنەم. ئیمامی ئەحمەد ڕیوایەتی كردووە لە عەمری كوڕی شوعەیبەوە لە باوكیەوە لە پێغەمبەرەوە(ﷺ) فەرمویەتی: خۆبەزل زانان لە ڕۆژی قیامەتا حەر دەكرێن وەك مێرولەی ورد لە وێنەی مرۆڤدا هەموو شتێكی ورد وبچوك بەسەریاندا سەركەوتوەو تا دەچنە بەندیخانەیەك لەناو جەهەنەمدا پێی دەوترێ (بولس) ئاگری ئەنیاربەسەریاندا سەركەوتووە، ئاویان دەرخوارد دەدرێت لە (طينة الخبال) كە چڵكاوی خەڵكی ئاگرە[2].

﴿وَإِذَا قِيلَ لَهُمْ ءَامِنُوا۟ بِمَآ أَنزَلَ ٱللَّهُ قَالُوا۟ نُؤْمِنُ بِمَآ أُنزِلَ عَلَيْنَا وَيَكْفُرُونَ بِمَا وَرَآءَهُۥ وَهُوَ ٱلْحَقُّ مُصَدِّقًا لِّمَا مَعَهُمْ ۗ قُلْ فَلِمَ تَقْتُلُونَ أَنۢبِيَآءَ ٱللَّهِ مِن قَبْلُ إِن كُنتُم مُّؤْمِنِينَ ﴿٩١﴾ ۞ وَلَقَدْ جَآءَكُم مُّوسَىٰ بِٱلْبَيِّنَٰتِ ثُمَّ ٱتَّخَذْتُمُ ٱلْعِجْلَ مِنۢ بَعْدِهِۦ وَأَنتُمْ ظَٰلِمُونَ ﴿٩٢﴾﴾

### جوولەكە بانگەشەی بڕوا دەكەن لەگەڵ حاشا كردن لە هەق

خودای گەورە ئەفەرموێت: ﴿وَإِذَا قِيلَ لَهُمْ ءَامِنُوا۟ بِمَآ أَنزَلَ ٱللَّهُ قَالُوا۟ نُؤْمِنُ بِمَآ أُنزِلَ عَلَيْنَا﴾ ئەگەر بێتو پێیان بڵێن: بەو كتێبەی خودا ناردویەتیە خوارەوە، بڕواتان هەبێ دەڵێن: ئێمە هەر بەوكتێبەی كە بۆخۆمان هاتۆتە خوارەوە،بڕوا دەكەین. ﴿وَإِذَا قِيلَ لَهُمْ﴾ واتە: ئەگەر بڵێن بە جوولەكە و هاووێنەكانیان لە ئەهلی كتێب ﴿ءَامِنُوا۟ بِمَآ أَنزَلَ ٱللَّهُ﴾ بڕوا بێنن بەوەی كە بۆ موحەمەد(ﷺ) هاتووە شوێنی كەون، ﴿قَالُوا۟ نُؤْمِنُ بِمَآ أُنزِلَ عَلَيْنَا﴾ ئەوانیش دەڵێن: ئێمە هەر بڕوا یەوە دەكەین كە لە تەورات و ئینجیلا هاتووە،دان بە هیچ شتێكی ترا نانێین جگە لەوانە ﴿وَيَكْفُرُونَ بِمَا وَرَآءَهُۥ﴾كتێبی تر با بڕواشی بە كتێبەكەی ئێمە هەبێ ئێمە بەڕاستی نازانین. واتە: بڕوایان بەوانی تر نیە. ﴿وَهُوَ ٱلْحَقُّ مُصَدِّقًا لِّمَا مَعَهُمْ﴾ باش دەزانن ئەوەی بۆ موحەمەد(ﷺ) هاتووە هەقە. ﴿ٱلْحَقُّ مُصَدِّقًا لِّمَا

---

[1] غافر ٦٠.

[2] أحمد /١٧٩/٢/ تیرمیزی بە حەسەنی داناوە.

مَعَهُمْ ﴾مەنسوبە لەسەر حال، یانی: هەر ئەوەی کە دەڵێن بڕوایان بە تەورات وئینجل هەیە دەبێتە بەڵگە لەسەریان کە دەبێ بڕواش بەوە بکەن کە بۆ موحەمەد(ﷺ) ڕەوانەکراوە. وەك خودای مەزن ئەفەرموێت: ﴿ٱلَّذِينَ ءَاتَيْنَـٰهُمُ ٱلْكِتَـٰبَ يَعْرِفُونَهُۥ كَمَا يَعْرِفُونَ أَبْنَآءَهُمْ ﴾[1] ئەهلی کتێب وەك کوڕانی خۆیان دەناسن ئەم پێغەمبەرە دەناسن. پاشان خودای مەزن ئەفەرموێت: ﴿فَلِمَ تَقْتُلُونَ أَنۢبِيَآءَ ٱللَّهِ مِن قَبْلُ إِن كُنتُم مُّؤْمِنِينَ ﴾ بڵێ: ئەگەر بڕواتان هەیە، باشە بۆچی لە پێشا پێغەمبەرانی خۆتان لە خوت و خۆڕایی دەکوشت؟ واتە: ئەگەر ڕاست دەکەن بۆچی ئەو پێغەمبەرانەتان دەکوشت کە هەر ئەو پەیامەی تەوراتی پێڕادەگەیاندن لەبەر دەستاندایە. کاری بەوە دەکردو نەسخیش نەکرابووەوە، دەشتان زانی ڕاست دەکەن؟ واتە: بەناڕەواو لاساری خۆتان بە زل دەزانی بەسەریاندا و دەتان کوشتن. ئێوە تەنها شوێن هەواو ئارەزوی خۆتان کەوتبوون وەك خودای گەورە ئەفەرموێت: ﴿أَفَكُلَّمَا جَآءَكُمْ رَسُولٌۢ بِمَا لَا تَهْوَىٰٓ أَنفُسُكُمُ ٱسْتَكْبَرْتُمْ فَفَرِيقًا كَذَّبْتُمْ وَفَرِيقًا تَقْتُلُونَ ﴾[2] تا ئێستا هەر پێغەمبەرێکتان بۆ هاتووە شتی وای وتووە کە ئێوە پێتان خۆش نەبووە، خۆتان لەو بەزل تر زانیوە، بە هەندێکتان وتووە درۆزن و هەندێکیشتان هەر کوشتوون. خودای مەزن سەرزەنشتیان دەکا لەم ئایەتەدا و ئەفەرموێت ﴿قُلْ فَلِمَ تَقْتُلُونَ أَنۢبِيَآءَ ٱللَّهِ مِن قَبْلُ إِن كُنتُم مُّؤْمِنِينَ ﴾[3] بڵێ: سا بۆچی لە پێشا پێغەمبەرانی خوداتان لە خوت و خۆڕایی دەکوشت. ﴿وَلَقَدْ جَآءَكُم مُّوسَىٰ بِٱلْبَيِّنَـٰتِ﴾ کاتێ موساش بە چەندین نیشانەی پتەو هاتە لاتان، وتی: کە ئەو پێغەمبەری خودایە. جگە لە خودا هیچ شت بۆ پەرستن ناشێ. چەندین نیشانە و بەڵگەی ئاشکرای پێدان کە بریتی بوو لە: باو باران وکوللە وئەسپێ وبۆق و خوێن و عەسا و دەست و لەت کردنی دەریا و سێبەرکردنی هەور بەسەرتانەوە و گەزۆ و مەلی شێلاقە و بەردو چەندین شتی تریش لەو نیشانانە کە بەچاوی خۆتان بینیتان: ﴿ثُمَّ ٱتَّخَذْتُمُ ٱلْعِجْلَ﴾ کەچی دوای ئەوە گوێرەکەیەکتان پەیدا کردو دەتان پەرست. لەسەردەمی موسادا جگە لە خودا. ﴿مِنۢ بَعْدِهِۦ﴾ واتە: دوای ئەوە لەلای ئێوە ڕۆشت بۆ کێوی توور بۆ پاڕانەوەو لالانەوە لە خودای گەورە وەك خودای مەزن ئەفەرموێت: ﴿ وَٱتَّخَذَ قَوْمُ مُوسَىٰ مِنۢ بَعْدِهِۦ مِنْ حُلِيِّهِمْ عِجْلًا جَسَدًا لَّهُۥ

---

[1] البقرة ١٤٦.

[2] البقرة ٨٧.

[3] ابن ابی حاتم /٢٨١/١ ص٧٩.

خُوَارٌ﴾[1] لەپاش موسا هۆزەکەی ئەو لەخشڵو زێڕی خۆیان پەیکەری گوێرەکەیەکیان دروست کرد کە هەر دەیبۆڕاند. پاشان خودای گەورە لێرەدا ئەفەرموێت: ﴿وَأَنتُمْ ظَٰلِمُونَ﴾ ناهەقیتان لە خۆتان کرد. لەو کارەدا کە پێی هەڵسان لە پەرستنی ئەو گوێرەکەدا، کە خۆتان چاك دەزانن هیچ پەرستراوێك نیە جگە لە خودا. وەك خودای مەزن لە ئایەتێکی ترا ئەفەرموێت: ﴿ وَلَمَّا سُقِطَ فِىٓ أَيْدِيهِمْ وَرَأَوْا۟ أَنَّهُمْ قَدْ ضَلُّوا۟ قَالُوا۟ لَئِن لَّمْ يَرْحَمْنَا رَبُّنَا وَيَغْفِرْ لَنَا لَنَكُونَنَّ مِنَ ٱلْخَٰسِرِينَ ﴾[2] کاتێ تەواو پەشیمانی دایگرتن و دیتیان سەریان لێشێواوە وتیان: ئەگەر پەروەردگارمان بەر بەزەیی خۆیمان نەخا ولە گوناهمان نەبورێ، ئێمە لە زیان بارانین.

﴿وَإِذْ أَخَذْنَا مِيثَٰقَكُمْ وَرَفَعْنَا فَوْقَكُمُ ٱلطُّورَ خُذُوا۟ مَآ ءَاتَيْنَٰكُم بِقُوَّةٍ وَٱسْمَعُوا۟ ۖ قَالُوا۟ سَمِعْنَا وَعَصَيْنَا وَأُشْرِبُوا۟ فِى قُلُوبِهِمُ ٱلْعِجْلَ بِكُفْرِهِمْ ۚ قُلْ بِئْسَمَا يَأْمُرُكُم بِهِۦٓ إِيمَٰنُكُمْ إِن كُنتُم مُّؤْمِنِينَ ﴿٩٣﴾﴾

**سەرپێچی جوولەکە دوای بەرزکردنەوەی کێوی توور و پەیمان لێوەرگرتن**

خودای گەورەئەفەرموێت: ﴿وَإِذْ أَخَذْنَا مِيثَٰقَكُمْ وَرَفَعْنَا فَوْقَكُمُ ٱلطُّورَ خُذُوا۟ مَآ ءَاتَيْنَٰكُم بِقُوَّةٍ وَٱسْمَعُوا۟ ۖ قَالُوا۟ سَمِعْنَا وَعَصَيْنَا وَأُشْرِبُوا۟ فِى قُلُوبِهِمُ ٱلْعِجْلَ بِكُفْرِهِمْ ۚ قُلْ بِئْسَمَا يَأْمُرُكُم بِهِۦٓ إِيمَٰنُكُمْ إِن كُنتُم مُّؤْمِنِينَ﴾ لەو کاتەیشدا کە پەیمانمان لەگەڵ بەستن و کێوی توورمان لە سەرتان بەرزکردەوەو پێمان وتن: هەرچی لە ئێمەوە بۆتان دێ بە توندی بیگرن و بیبیستن وتیان: بەڵێ بیستمان و گوێی نادەینێ، شەیدای گوێرەکە پەرستی وەها لە دڵیان چەقیبوو، باوەڕی لە بیر بردنەوە، بڵێ: ئەگەر بڕوادارن، بڕواکەتان توشی زۆر ئاکاری نالەباری کردوون. خودای گەورە هەڵەو سەرپێچی و لاساری و تاوانەکانی لەسەر هەژمار کردوون، کێوی تووری بەرز کردەوە بەسەریانەوە تا پەیمانەکەیانی قبوڵ کرد پاشان لێی پەشیمان بوونەوە. هەربۆیە: ﴿قَالُوا۟ سَمِعْنَا وَعَصَيْنَا﴾ وتیان: بیستمان و گوێی پێنادەین: ﴿وَأُشْرِبُوا۟ فِى قُلُوبِهِمُ ٱلْعِجْلَ بِكُفْرِهِمْ ۚ﴾ ئەوینی گوێرەکە پەرستی وەها چوبویە دڵیان، باوەڕی لە بیر بردنەوە. عەبدورەزاق ئەڵێت: لە موعەمەرەوە لە قەتادەوە ئەڵێت: خۆشەویستی گوێرەکەکە بەتەواوی چوبوە ناو دڵیانەوە[3]. ئەبولعالیە و ڕەبیعی کوڕی

---

[1] الاعراف ١٤٨.

[2] الاعراف ١٤٩.

[3] عبدالرزاق/١/٥٢ ص٧٩.

ئەنەسیش هەر وایان وتووە[1]. پاشان خودای گەورە ئەفەرموێت: ﴿قُلۡ بِئۡسَمَا يَأۡمُرُكُم بِهِۦٓ إِيمَٰنُكُمۡ إِن كُنتُم مُّؤۡمِنِينَ﴾ ئەگەر بڕوادارن! بڕواکەتان توشی کارێکی زۆر نالەباری کردوون. واتە: کارێکی زۆر خراپ و نالەبارتان کردووە هەرلەدێر زەمانەوە ئێستاش کە حاشاتان کردووە لە نیشانەکانی خودا و سەرپێچی پێغەمبەرانتان کردووە، پاشان متمانەتان بە خۆتان کردووە لە بڕوانەهێنان بە موحەمەد(ﷺ) کەئەوە گەورەترین تاوانتانە و زۆر زیاتر ئەمەتان لەسەر دەکەوێ. کاتێ کە بڕواتان نەهێنا بە دوایین پێغەمبەر و گەورەی هەموو پێغەمبەران سەلامی خوایان لێبێ کە ڕەوانە کراوە بۆ هەموو خەڵکی. ئیتر چۆن بانگەشەی بڕوا دەکەن بۆ خۆتان کە هەڵسان بەم کارە خراپ و ناشرینانە. پەیمانتان شکاند، بڕواتان بە نیشانەکانی خودا نەکرد، دەستتان دایە گوێرەکە پەرستی؟

﴿قُلۡ إِن كَانَتۡ لَكُمُ ٱلدَّارُ ٱلۡأٓخِرَةُ عِندَ ٱللَّهِ خَالِصَةٗ مِّن دُونِ ٱلنَّاسِ فَتَمَنَّوُاْ ٱلۡمَوۡتَ إِن كُنتُمۡ صَٰدِقِينَ ﴿٩٤﴾ وَلَن يَتَمَنَّوۡهُ أَبَدَۢا بِمَا قَدَّمَتۡ أَيۡدِيهِمۡۚ وَٱللَّهُ عَلِيمُۢ بِٱلظَّٰلِمِينَ ﴿٩٥﴾ وَلَتَجِدَنَّهُمۡ أَحۡرَصَ ٱلنَّاسِ عَلَىٰ حَيَوٰةٖ وَمِنَ ٱلَّذِينَ أَشۡرَكُواْۚ يَوَدُّ أَحَدُهُمۡ لَوۡ يُعَمَّرُ أَلۡفَ سَنَةٖ وَمَا هُوَ بِمُزَحۡزِحِهِۦ مِنَ ٱلۡعَذَابِ أَن يُعَمَّرَۗ وَٱللَّهُ بَصِيرُۢ بِمَا يَعۡمَلُونَ ﴿٩٦﴾﴾

## بانگکردنی جوولەکە بۆ موباهەلە

خودای مەزن ئەفەرموێت: ﴿قُلۡ إِن كَانَتۡ لَكُمُ ٱلدَّارُ ٱلۡأٓخِرَةُ عِندَ ٱللَّهِ خَالِصَةٗ مِّن دُونِ ٱلنَّاسِ فَتَمَنَّوُاْ ٱلۡمَوۡتَ إِن كُنتُمۡ صَٰدِقِينَ﴾ بڵێ: ئەگەر بەڕاستانە و پێتان وایە لە خوداوە ماڵی ئەولا بۆ ئێوە تەرخان کراوە و بەشی کەسی تێدا نیە، دەسا داوا بکەن بمرن. موحەمەدی کوڕی ئیسحاق ڕیوایەتی کردووە لە ئیبنو عەباسەوە ڕەزای خوای لێبێ خودای مەزن ئەفەرموێت بە موحەمەد(ﷺ): ﴿قُلۡ إِن كَانَتۡ لَكُمُ ٱلدَّارُ ٱلۡأٓخِرَةُ عِندَ ٱللَّهِ خَالِصَةٗ مِّن دُونِ ٱلنَّاسِ فَتَمَنَّوُاْ ٱلۡمَوۡتَ إِن كُنتُمۡ صَٰدِقِينَ﴾ داوای مردن بکەن بۆ هەر کۆمەڵێ لەو درۆزنانە، جوولەکە ملیان بەوە نەدا بە پێغەمبەری خودا(ﷺ)[2]: ﴿وَلَن يَتَمَنَّوۡهُ أَبَدَۢا بِمَا قَدَّمَتۡ أَيۡدِيهِمۡۚ وَٱللَّهُ عَلِيمُۢ بِٱلظَّٰلِمِينَ﴾ بێگومان هەرگیز ئەو داوایە ناکەن چونکە دەزانن چیان کردووە، خودایش ستەم کاران دەناسێ. واتە: خودا خۆی دەزانێ کە شارەزاییان دەربارەی تۆ هەیە ئەی موحەمەد(ﷺ) هەر بڕوات پێناکەن. خۆ ئەو ڕۆژە داوای مردنیان بکردایە کە پێی وتن، تەنیا

---

[1] ابن ابی حاتم /١/٢٨٣.

[2] ابن ابی حاتم /١/٢٨٤ ص٨٠.

جوولەکەیە لەسەر زەمینا نەدەما و هەموو ئەمردن. زەحجاك لە ئیبنو عەباسەوە: ﴿فَتَمَنَّوُا۟ ٱلْمَوْتَ﴾ داوای مردن بکەن[1]. عەبدورەزاق ئەڵێت: لە عیکرەمەوە لەم دەقەدا کە خوای گەورە ئەفەرموێت: ﴿فَتَمَنَّوُا۟ ٱلْمَوْتَ إِن كُنتُمْ صَٰدِقِينَ﴾ داوای مردن بکەن ئەگەر بەڕاستتانە. ئیبنو عەباس ئەڵێت: ئەگەر جوولەکە داوای مردنیان بکردایە بێگومان ئەمردن[2]. ئیبنو ئەبی حاتەم ڕیوایەتی کردووە لە سەعیدی کوڕی جوبەیرەوە لە ئیبنو عەباسەوە ئەڵێت: ئەگەر داوای مردنیان بکردایە هەرکەسەو بە تف ولیکی خۆی دەمی دەگیرا[3]. واتە: دەمردن. ئەم سەنەدانە تا دەگاتە ئیبنو عەباس ڕاستن. ئیبنو جەریر لە تەفسیرەکەیدا ئەڵێت: پێمان گەیشتووە لە پێغەمبەرەوە(ﷺ) فەرمویەتی: ئەگەر جوولەکە داوای مردنیان بکردایە، بێگومان شوێنی خۆیان لەناو ئاگرا دەبینی، ئەگەر ئەوانە دەرچونایە کە موباهەلەیان لەگەڵ پێغەمبەرا(ﷺ) دەکرد. واتە: دوای موباهەلەکە کە نەیان کردکاتێ کە دەگەڕانەوە کەس و کارو ماڵ و سامانیان نەدەبینیەوە[4]. واتە: هەموو دەمردن. وێنەی ئەم ئایەتە لە سوورەتی جومعەدا هاتووە خودای گەورە ئەفەرموێت: ﴿قُلْ يَٰٓأَيُّهَا ٱلَّذِينَ هَادُوٓا۟ إِن زَعَمْتُمْ أَنَّكُمْ أَوْلِيَآءُ لِلَّهِ مِن دُونِ ٱلنَّاسِ فَتَمَنَّوُا۟ ٱلْمَوْتَ إِن كُنتُمْ صَٰدِقِينَ ﴿٦﴾ وَلَا يَتَمَنَّوْنَهُۥٓ أَبَدًۢا بِمَا قَدَّمَتْ أَيْدِيهِمْ ۚ وَٱللَّهُ عَلِيمٌۢ بِٱلظَّٰلِمِينَ ﴿٧﴾ قُلْ إِنَّ ٱلْمَوْتَ ٱلَّذِى تَفِرُّونَ مِنْهُ فَإِنَّهُۥ مُلَٰقِيكُمْ ۖ ثُمَّ تُرَدُّونَ إِلَىٰ عَٰلِمِ ٱلْغَيْبِ وَٱلشَّهَٰدَةِ فَيُنَبِّئُكُم بِمَا كُنتُمْ تَعْمَلُونَ﴾[5] بڵێ: ئەی ئەوانەی کە جوولەکەن! ئەگەر ئێوە پێتان وایە زیاد لە مرۆڤ هەرئێوە دۆستانی خودان، دەسا ئەگەر قسەتان ڕاستە، مردنی خۆتان داوا بکەن، ئەوەندە خراپەیان کردووە هەرگیز داوای مردن ناکەن، خودا ئاگاداری ستەمکارانە. بڵێ: ئەو مەرگەی کە ئێوە لێی ڕادەکەن، هەر دەتان گاتێ و پاشان هەر دەتان باتەوە بۆلای زانای نەدیارو دیاران. ئەوسا خۆی پێتان ئەفەرموێت چیتان کردووە، ئەوانە بەر نەفرینی خودا کەون، کاتێ کە دەیان وت ئێمە فەرزندە و خۆشەویستانی خوداین و هیچ کەسێ ناچێتە بەهەشت ئەگەر گاورو جوولەکە نەبێ. داوای موباهەلە و نزاکردن کرا لەو دوو کۆمەڵە کە درۆ دەکەن، لەوان و لە مسوڵمانان. ئەگەر ئەوەیان نەکرد، ئیتر هەریەکێ لەوانە دەزانێ کە ئەوان ستەمکارن، ئەگەر ڕاستیان بکردایە لەوەدا دەڵێن ئەوا بێسێو دوو بەو کارە هەڵئەسان، بەڵام کاتێ کە خۆیان دواخست و نەهاتن، ئیتر درۆکەیان دەرکەوت. هەر بەو جۆرەش پێغەمبەری خودا(ﷺ) شاندی

---

[1] الطبری /٢/٣٦٦ ص٨٠.

[2] ابن ابی حاتم /١/٢٨٥.

[3] ابن ابی حاتم /١/٢٨٤.

[4] الطبری /٢/٣٦٢.

[5] الجمعة ٦-٨.

ئەجوانی بانگ کرد لە مەسیحیەکان دوای هێنانەوەی نیشانەو بەڵگەی ئاشکرا لەو ڕوبەڕووبوونەوەدا لاساریان کردو ملیان نەدا و داوای موباهەلەیان کرد. خوای گەورە ئەفەرموێت: ﴿فَمَنْ حَآجَّكَ فِيهِ مِنۢ بَعْدِ مَا جَآءَكَ مِنَ ٱلْعِلْمِ فَقُلْ تَعَالَوْا۟ نَدْعُ أَبْنَآءَنَا وَأَبْنَآءَكُمْ وَنِسَآءَنَا وَنِسَآءَكُمْ وَأَنفُسَنَا وَأَنفُسَكُمْ ثُمَّ نَبْتَهِلْ فَنَجْعَل لَّعْنَتَ ٱللَّهِ عَلَى ٱلْكَـٰذِبِينَ﴾[1] هەرکەسێ دوای ئەو زانستەی بۆتۆ هات، ویستی کێشەت لەگەڵا بکا، بڵێ: وەرن با کوڕانمان و ژنانمان و یەکتر بانگ بکەین و ئەوسا دەست کەینە لاڵەو نزا و ئەفرینی خودا بنێرین بۆ ئەوانەی کەوا درۆزنن، کاتێ کە ئەوەیان بینی، هەندێ لەوانە بە هەندێکی تریان ووت، سوێند بە خوا ئەگەر موباهەلە بکەن لەگەڵ ئەو پێغەمبەرە، کەسێ لە ئێوە نامێنێ چاو بنێ بەیەکا، لەو کاتەدا ملیان دا بۆ ڕێکەوتن و سەریان شۆڕ کردو سەرانەیان لەسەر دانرا و سەرانەیان دا. ئەبو عوبەیدەی لەگەڵ ناردن و کردیە ئەمینیان. وەهەر لەومانایە یان نزیك لەمە، خودای مەزن فەرموی بە پێغەمبەرەکەی (ﷺ) کە بە بتپەرستەکان بڵێ: ﴿قُلْ مَن كَانَ فِى ٱلضَّلَـٰلَةِ فَلْيَمْدُدْ لَهُ ٱلرَّحْمَـٰنُ مَدًّا﴾[2] کەسێ لە گومڕایدا تل ئەدا، با خوا پەتی بۆ شل بکا و وێڵی بکا. واتە: هەرکەسێ لە ئێمە یان لە ئێوە لە گومڕایدا بەردەوام بوو، خودا ئەو گومڕاییەی بۆ زیاد کردووە، ماوەی ئەدات و پەتی بۆ شل دەکا، وەك بەو زوانە لە جێی خۆیدا باسی دێت بە ویستی خودای مەزن. ئەم ئایەتە تەفسیر کراوە بە داواکردنی مردن، بێ ئەوەی باسی مەباهەلەی کردبێ ئەم موباهەلەیە ناونراوە بە داخوازی، چونکە هەموو هەق بە دەستێ حەز دەکا کە خودا ناهەقی کارەکەی لەناو بەرێ کەکێشەی لەگەڵا دەکا. بەتایبەتی ئەگەر ئەو کەسە بەڵگەی بەدەستەوە بوو بۆ دەرخستن و ئاشکراکردنی هەقەکەی. موباهەلە بۆ مردنە، چونکە ژیان لەلای ئەوانە زۆرگرنگ و گەورەیە، کاتێ کەدەزانن لەدوای مردن چەندە شوێنیان نالەبارو خراپە.

## سوورو ئامەزرۆی تەمەن درێژین

لەبەر ئەوەیە خودای گەورە ئەفەرموێت: ﴿وَلَن يَتَمَنَّوْهُ أَبَدًۢا بِمَا قَدَّمَتْ أَيْدِيهِمْ ۗ وَٱللَّهُ عَلِيمٌۢ بِٱلظَّـٰلِمِينَ ﴿٩٥﴾ وَلَتَجِدَنَّهُمْ أَحْرَصَ ٱلنَّاسِ عَلَىٰ حَيَوٰةٍ﴾ هەرگیز ئەو داوایە ناکەن، چونکە دەزانن چیان کردووە، خوداش ستەمکاران دەناسێ، بێگومان دەیان بینی لە دونیادا لە هەموو کەس بۆ ژیان ئامەزرۆترن. واتە: ئارەزوی تەمەن درێژی دەکەن، کە دەزانن چ ژیانێکی ناخۆش و پاشاڕۆژێکی خراپ چاوەڕوانیانە لەلای خودا. چونکە دنیا بەندیخانەی خاوەنباوەڕە و بەهەشتی خوانەناسانە. ئەوانە حەز دەکەن لە ڕۆژی دوایی دورکەونەوە بەهەر شێوەیەك بۆیان ڕێکەوێ، بێگومان ئەوەی ئەوان لێی دەترسن هەر دێتە

---

[1] ال عمران ٦١.

[2] مریم ٧٥.

ڕێیان و لێی دەرباز نابن، هەر بۆیە لە بتپەرستەکان ئەوانەی کەکتێبیان نیە زیاتر تامەزرۆی ژیانی دونیان، ئیبنو ئەبی حاتەم ڕیوایەتی کردووە لە ئیبنو عەباسەوە: ﴿وَمِنَ الَّذِينَ أَشْرَكُوا﴾ تەنانەت لەو کەسانەش کە شەریك بۆ خوا دادەنێن. واتە: لەعەجەمەکان[1]. حاکمیش هەر بەو جۆرە ڕیوایەتی کردووە لە موستەدرەکەکەیدا و وتی: لەسەر مەرجی بوخاری و موسلیم بەلاّم ئەوان نەیان هێناوە[2].

موجاهید ئەڵێت: ﴿يَوَدُّ أَحَدُهُمْ لَوْ يُعَمَّرُ أَلْفَ سَنَةٍ﴾ هەر کام لەوان پێی خۆشە هەزار ساڵ بژی. دیارە تاوان و خراپە تەمەن درێژی لا خۆشەویست کردوون[3]. موحەمەدی کوڕی ئیسحاق ڕیوایەتی کردووە لە ئیبنو عەباسەوە: ﴿وَمَا هُوَ بِمُزَحْزِحِهِ مِنَ الْعَذَابِ أَنْ يُعَمَّرَ﴾خۆ تەمەنی هەزار ساڵەش دوری ناخاتەوە لە ئازار. واتە: لە سزا ڕزگاری ناکا. چونکە موشریك بە هیوای زیندو بونەوە نیە پاش مردن بۆیە تەمەن درێژی پێخۆشە. خۆ جوولەکە زانیویەتی لە ڕۆژی دوایدا چ سزاو تۆڵەیە چاوەڕوانیەتی. بەهۆی شاردنەوەی ئەو زانیاریان کە لەلای بووە[4]. عەبدورەحمانی کوڕی زەیدی کوڕی ئەسلەم لەم ئایەتەدا ئەڵێت: جوولەکە لە بتپەرستەکان زیاتر تامەزرۆن لەسەر ژیان، ئەوانە پێیان خۆشە تەمەنیان هەزار ساڵبێت، خۆ تەمەنی هەزار ساڵیش هەر لە سزا دوریان ناخاتەوە. وەك چۆن تەمەنی شەیتان هیچ سودێکی نیە بۆی کە خوانەناسە[5]. ﴿وَاللَّهُ بَصِيرٌ بِمَا يَعْمَلُونَ﴾ خودا هەموو کردارەکانیانی لەبەر چاوە. واتە: خودا ئاگادارو زانایە بەهەر شتێ عەبدەکانی دەیکەن لە چاکەو لە خراپە هەرکەسەو بە پێی کرداری پاداشتی ئەداتەوە.

﴿قُلْ مَنْ كَانَ عَدُوًّا لِجِبْرِيلَ فَإِنَّهُ نَزَّلَهُ عَلَى قَلْبِكَ بِإِذْنِ اللَّهِ مُصَدِّقًا لِمَا بَيْنَ يَدَيْهِ وَهُدًى وَبُشْرَى لِلْمُؤْمِنِينَ ﴿٩٧﴾ مَنْ كَانَ عَدُوًّا لِلَّهِ وَمَلَائِكَتِهِ وَرُسُلِهِ وَجِبْرِيلَ وَمِيكَالَ فَإِنَّ اللَّهَ عَدُوٌّ لِلْكَافِرِينَ ﴿٩٨﴾﴾

**جوولەکە دژایەتی جوبرەئیل دەکەن**

خودای گەورە ئەفەرموێت: ﴿قُلْ مَنْ كَانَ عَدُوًّا لِجِبْرِيلَ فَإِنَّهُ نَزَّلَهُ عَلَى قَلْبِكَ بِإِذْنِ اللَّهِ مُصَدِّقًا لِمَا بَيْنَ يَدَيْهِ وَهُدًى وَبُشْرَى لِلْمُؤْمِنِينَ﴾ بڵێ: هەرکەسێ کە دوژمنی جوبرەئیلە بابزانێ هەر ئەوە کە ئەم قورئانە بە ئیزنی خودا ڕەوانەی دڵی تۆ دەکا و بە کتێبەکانی تری ئاسمانیش باوەڕ دەکا و ڕێ

---

[1] ابن ابی حاتم /١/٢٨٦ ص٨٠.
[2] الحاكم /٢/٢٦٣.
[3] ابن ابی حاتم /١/٢٨٧.
[4] ابن ابی حاتم /١/٢٨٨.
[5] الطبری /٢/٣٧٦.

نیشاندەر و مژدەدەرە بۆئەوانەی باوەڕدارن. ئیمام ئەبو جەعفەر ئیبنو جەریری تەبەری ڕەحمەتی خوای لێبێ ئەڵێت: زانایانی ئەهلی زانستی تەئویل هەموو کۆدەنگن لەسەر ئەوە کە ئەم ئایەتە لە وەڵامی جوولەکەدا لە نەوەی ئیسرائیل هاتۆتە خوارەوە. کە وتویانە جوبرەئیل دوژمنیانە و میکائیل دۆستیانە[1]. بوخاری ئەڵێت: لەم دەقەدا کە خوای مەزن ئەفەرموێت: ﴿مَن كَانَ عَدُوًّا لِّجِبْرِيلَ﴾ عیکرەمە ئەڵێت: (جبر و میك و إسراف عبده، إیل: الله) یە. پاشان ڕیوایەتی کردووە لە ئەنەسی کوڕی مالیکەوە ئەڵێت: عەبدڵڵای کوڕی سەلام هەواڵی گەیشتنی پێغەمبەری خودای (ﷺ) پێ گەیشت، لەناو زەویەکدا بوو میوەی دەچنی، هات بۆلای پێغەمبەر(ﷺ)وتی: من پرسیارت لە سێ شت لێدەکەم هیچ کەسێ نایان زانێ جگە لە پێغەمبەر. سەرەتای نیشانەکانی قیامەت کامەیە؟ وە یەکەم خۆراکی ئەهلی بەهەشت چیە؟ وە چۆن منداڵ دەچێ بۆ لای باوکی یان بۆلای دایکی؟ فەرموی: جوبرەئیل ماوەیە لەمەو پێش هەواڵی دامێ پێیان، وتی: جوبرەئیل؟ فەرموی: بەڵێ، وتی: ئەوەی دوژمنی جوولەکەیە لە فریشتەکان. ئەم ئایەتەی خوێندەوە: ﴿مَن كَانَ عَدُوًّا لِّجِبْرِيلَ فَإِنَّهُ نَزَّلَهُ عَلَىٰ قَلْبِكَ﴾ هەر کەسێ کە دوژمنی جوبرەئیلە بابزانێ هەر ئەوە ئەم قورئانەی بە ئیزنی خودا ڕەوانەی دڵی تۆ دەکا. لەبارەی یەکەم نیشانەکانی ڕۆژی قیامەت، ئاگرێکە خەڵکی کۆدەکاتەوە لە ڕۆژهەڵاتەوە بۆ ڕۆژ ئاوا، وە یەکەم خواردنێ خەڵکی بەهەشت دەیخۆن زیادەی جگەری نەهەنگە، وە ئەگەر ئاوی پیاو پێش ئاوی ژن کەوت بە ویستی خودا کوڕیان دەبێ وە ئەگەر ئاوی ژن پێش ئاوی پیاو کەوت بە ویستی خودا کچیان دەبێ. وتی: أشهد أن لا إله ألا الله و أنك رسول الله، ئەی پێغەمبەری خودا(ﷺ)! جوولەکە درۆ هەڵبەسن. ئەوانە ئەگەر بزانن من مسوڵمان بووم لە پێش ئەوە کە پرسیاریان لێبکەی بوختانم بۆ دەکەن. جوولەکەکان هاتن پێغەمبەری خودا(ﷺ) فەرموی پێیان: عەبدڵڵای کوڕی سەلامْ پیاوێکی چۆنە لە نێوانتاندا؟ وتیان: چاکترینمانە و کوڕی چاکترینیشمانە. فەرموی: ئەگەر دیتان مسوڵمان بووە، وتیان: پەنا دەگرێ بە خوا لەوە. عەبدڵلا چوە دەرەوەو وتی: أشهدأن لا إله إلاالله و أشهد أن محمدا رسول الله، وتیان: ئەوە خراپترینمانە و کوڕی خراپترینمانە. دژی وەستان. وتی: ئەمە ئەوە بوو کە لێی دەترسام ئەی پێغەمبەری خودا(ﷺ) بەم شێوەیە تەنیا بوخاری هێناویەتی[2]. بوخاری و موسلیم بە جۆرێکی تر هێناویانە لە ئەنەسەوە[3]. هەندێ دەڵێن: (إیل) یانی: (عبد) وتەکەی تری ناوی خودا (الله) یە. چونکە وتەی (إیل) لە هەموویاندا ناگۆڕێ. بەرانبەر بە عبداللهو عبد الرحمن و عبد

---

[1] الطبری /٢/٣٧٧.

[2] فتح الباری /٨/١٥/٧/٣١٩ ص٨١.

[3] البخاری /٣٣٢٩/٣٩١١/٣٩٣٨/، مسلم/٣١٥.

الملیك و عبد القدوس و عبد السلام و عبد الكافی و عبد الجلیل، واته: (عبد)له هەموویاندا هەیه. بەڵام ئەو ناوانەی دراونەته پاڵی جیاوازه جبرئیل و إسرافیل و میكائیل و عزرائیلیش هەروایه، له زمانەكانی تری جگه له زمانی عەرەبی موزاف و ئیلەیهی پێش موزاف دەخەن، و الله أعلم.

**جیاوازی كردن له نێوان فریشتەكاندا وەك جیـاوازی كردنـه لـه نێـوان پێغەمبەرانـدا (سـەلامی خوایان لێبێت)**

دەربارەی تەفسیری ئەم ئایەته كه خوای مەزن ئەفەرموێت: ﴿قُلْ مَن كَانَ عَدُوًّا لِّجِبْرِيلَ فَإِنَّهُ نَزَّلَهُ عَلَىٰ قَلْبِكَ بِإِذْنِ اللَّهِ﴾ بڵێ: هەركەسێ كه دوژمنی جوبرەئیله با بزانێ هەر ئەوه كه ئەم قورئانەی به ئیزنی خوا ڕەوانەی دڵی تۆ دەكا، واته: هەركەسێ كه دوژمنایەتی جوبرەئیل بكا با چاك بزانێ كه جوبرەئیل ئەو قورئانەی هێناوەته دڵی تۆ لەلایەن خوداوەو به ئیزنی ئەو بووه. ئەو فریشتەی ڕەوانەكراوی خودا بووه، هەركەسێ دژایەتی پێغەمبەرێ بكا. ئەوه دژایەتی گشت پێغەمبەرانی كردووه. وەك چۆن كەسێ بڕوای به پێغەمبەرێ نەبێ وەك بڕوای به گشت پێغەمبەرێ نەبێ وایه. وەك خودای مەزن ئەفەرموێت: ﴿إِنَّ الَّذِينَ يَكْفُرُونَ بِاللَّهِ وَرُسُلِهِ وَيُرِيدُونَ أَن يُفَرِّقُوا بَيْنَ اللَّهِ وَرُسُلِهِ وَيَقُولُونَ نُؤْمِنُ بِبَعْضٍ وَنَكْفُرُ بِبَعْضٍ﴾[1] ئەوكەسانەی دڵیان دژی خوداو پێغەمبەرەكانیەتی و دیاره دەیان هەوێ له نێوان خودا و پێغەمبەرەكانی جیاوازی دابنێن، ئەڵێن: ئێمه باوەڕ به هەندێكیان دەكەین، هەندێكیشیان به جێگەی باوەڕ نازانین، دەیان هەوێ لەم نێوانەدا ڕێگەیەك بۆ خۆیان پەیدا بكەن. بەڕاستی كه ئەمانه خوانەناسن، ئێمه بۆ ئەو خوانەناسانه ئازاری ئابڕوبەرمان ئامادە كردووه. خوای گەورەبه خوانەناسی داناون ئەگەر بڕوایان به هەندێ له پێغەمبەران ببێ و بڕوایان به هەندێكی تریان نەبێ. هەر بەو جۆرەیش هەركەسێ دژایەتی جوبرەئیل بكا، بێگومان دوژمنی خوایه چەنكه جوبرەئیل به ئارەزوی خۆی بۆ هیچ كارێ دانابەزێت، بەڵكو به فەرمانی پەروەردگاری دێته خوارەوه. وەك خودای گەوره ئەفەرموێت: ﴿وَمَا نَتَنَزَّلُ إِلَّا بِأَمْرِ رَبِّكَ﴾[2] به فەرمانی پەروەردگاری تۆ نەبێ ئێمه هەر دانابەزینه خوار. وه ئەفەرموێت: ﴿وَإِنَّهُ لَتَنزِيلُ رَبِّ الْعَالَمِينَ ﴿١٩٢﴾ نَزَلَ بِهِ الرُّوحُ الْأَمِينُ ﴿١٩٣﴾ عَلَىٰ قَلْبِكَ لِتَكُونَ مِنَ الْمُنذِرِينَ﴾[3] ڕامێنەری هەموو جیهان ئەم قورئانەی ناردۆته خوار (روح الامین) هێنایه خوار بۆ سەر دڵت، تا تۆ له ترسێنەران بیت. بوخاری ڕیوایەتی كردووه له سەحیحەكەیدا له ئەبو هورەیرەوه ئەڵێت:

---

[1] النساء ١٥٠-١٥١.

[2] مريم ٦٤.

[3] الشعراء ١٩٢-١٩٤.

پێغەمبەری خودا(ﷺ) فەرمویەتی: خودای مەزن فەرمویەتی: هەرکەسێ دوژمنایەتی لەگەڵ دۆستێکی منا بکا، ئەوە شەڕی لەگەڵ منا کردووە[1]. هەر بۆیە خودا لەبەر جوبرەئیل تورە بووە لەوەی کە دژایەتی دەکا. خودای گەورە ئەفەرموێت: ﴿مَن كَانَ عَدُوًّا لِّجِبْرِيلَ فَإِنَّهُ نَزَّلَهُ عَلَىٰ قَلْبِكَ بِإِذْنِ اللَّهِ مُصَدِّقًا لِّمَا بَيْنَ يَدَيْهِ﴾ بلێ: هەر کەس کە دوژمنی جوبرەئیله با بزانێ هەر ئەوە کە ئەم قورئانەی بە ئیزنی خودا ڕەوانەی دڵی تۆ دەکا و بە کتێبەکانی تری ئاسمانیش باوەڕ دەکا و ڕێنیشاندەرو مژدەدەرە بۆ ئەوانەی کە باوەڕدارن. ﴿وَهُدًى وَبُشْرَىٰ لِلْمُؤْمِنِينَ﴾ واتە: ڕێبەرە بۆ دڵەکانیان و مژدەی بەهەشتیشیان پێئەدا، ئەمەیش تەنیا هەر بۆخاوەن باوەڕانە. وەك خودای گەورە ئەفەرموێت: ﴿قُلْ هُوَ لِلَّذِينَ آمَنُوا هُدًى وَشِفَاءٌ﴾[2] بلێ: ئەمە بۆ کەسانێ کە باوەڕیان پێهێناوە ڕێبەرو چارەی دەردانە. وە ئەفەرموێت: ﴿وَنُنَزِّلُ مِنَ الْقُرْآنِ مَا هُوَ شِفَاءٌ وَرَحْمَةٌ لِّلْمُؤْمِنِينَ﴾[3] ئێمە لەم قورئانە شتی وا ڕەوانە ئەکەین کەشیفا و بەزەیی تێدایە بۆخاوەنباوەڕان. پاشان خودای مەزن ئەفەرموێت: ﴿مَن كَانَ عَدُوًّا لِّلَّهِ وَمَلَائِكَتِهِ وَرُسُلِهِ وَجِبْرِيلَ وَمِيكَالَ فَإِنَّ اللَّهَ عَدُوٌّ لِّلْكَافِرِينَ﴾ هەرکەسێ دژی خوداو پێغەمبەرەکانی و فریشتەکانی و جوبرەئیل و میکائیل بێ، خودایش دژی خوانەناسانە. خودای گەورە ئەفەرموێت: هەرکەسێ دژایەتی من و فریشتەکانم و ڕوانەکراوەکانم بکا، ڕەوانەکراوەکان نێراوی فریشتە و مرۆڤیش دەگرێتەوە. وەك خودای مەزن ئەفەرموێت: ﴿اللَّهُ يَصْطَفِي مِنَ الْمَلَائِكَةِ رُسُلًا وَمِنَ النَّاسِ﴾[4] خودا لەناو فریشتەکان پەیام نێرێ هەڵدەبژێرێ، لەناو مرۆڤیشا هەروا. ﴿وَجِبْرِيلَ وَمِيكَالَ﴾ ئەمانە لە ڕیزی فریشتەکاندان لەناو گشت ڕەوانە کراوەکاندا، پاشان بەتایبەتی باسیان هاتووە، چونکە باسەکە، باسی پشتگیری جوبرەئیلە، کە سەفیرە لە نێوان خودا و پێغەمبەرەکانیدا. ناویشی لەگەڵ میکائیلا داناوە، لەبەر ئەوە جوولەکە دەڵێن: جوبرەئیل دوژمنی ئێمەیە و میکائیل دۆستمانە. خودای گەورەش ئاگاداری کردوون، هەرکەسێ دژایەتی یەکێکیان بکا ئەوا دژایەتی ئەوی تریشیانی کردووە و دژایەتی خودایشی کردووە. چونکە میکائیلیش هەندێ جار ڕەوانە دەکرێ بۆلای هەندێ لە پێغەمبەران. بەڵام جوبرەئیل زیاتر دادەبەزێت. ئەوە کارو ئەرکی ئەوە، وەك چۆن ئیسرافیل

---

[1] فتح الباری /١١/٣٤٨ ص٨٢.

[2] فصلت ٤٤.

[3] الاسراء ٨٢.

[4] الحج ٧٥.

فوکردنی بە کەڵە شاخا پێسپێراوە بۆ زیندو بوونەوە لە ڕۆژی قیامەتدا. هەر بۆیە لە فەرمودەی سەحیحدا هاتووە کە پێغەمبەری خودا (ﷺ) کاتێ کە لە شەودا هەڵدەستا ئەیفەرموو: ئەی خودایە! پەروەردگاری جوبرەئیل و میکائیل و ئیسرافیل، وەدی هێنەری ئاسمانەکان و زەمین زانا بە نەدیار دیارەکان، تۆ فەرمان ڕەوایی دەکەی لە نێوان عەبدەکاندا لەو شتانە تێدا ناکۆکن و جیاوازن، ڕێنمایم بکە لەو شتانەی ناکۆکی تێدایە بە ئیزنی خۆت لە هەقا، بێگومان تۆ مەیلت لە هەر کەس بێ ڕێنمایی دەکەی بۆ سەر ڕاستە ڕێ[1]. خودای گەورە ئەفەرموێت: ﴿فَإِنَّ ٱللَّهَ عَدُوٌّ لِّلۡكَٰفِرِينَ﴾ خودایش دوژمنی خوانەناسانە. ناوی خودا بە ئاشکرا هاتووە لە باتی ئەوەی بە (زەمیر) بێت، نەی فەرمووە (فانه عدو للكفرين) بەڵکو فەرمویەتی: ﴿فَإِنَّ ٱللَّهَ عَدُوٌّ لِّلۡكَٰفِرِينَ﴾ خودا دوژمنی خوانەناسانە. بۆیە خودا ناوی (الله) ی هێناوە بۆ جێگیر کردنی ئەم مانایە و دەرخستنی و ئاگادار کردنیان لەوە کە هەرکەسێ دژایەتی دۆستێکی خودا بکا ئەوە دژایەتی خودای کردووە. هەرکەسیش دژایەتی خودا بکا. خودایش دوژمنی ئەوکەسەیە، هەرکەسیش خودا دوژمنی بوو، زیانباری دنیاو قیامەتە. وەك ئەم فەرمودەیەمان هێنا کە ئەفەرموێت: هەرکەسێ دژایەتی دۆستێکی من بکا بێگومان جاڕی شەڕی لەگەڵ ئەدەم[2].

﴿وَلَقَدۡ أَنزَلۡنَآ إِلَيۡكَ ءَايَٰتِۭ بَيِّنَٰتٖۖ وَمَا يَكۡفُرُ بِهَآ إِلَّا ٱلۡفَٰسِقُونَ ﴿٩٩﴾ أَوَكُلَّمَا عَٰهَدُواْ عَهۡدٗا نَّبَذَهُۥ فَرِيقٞ مِّنۡهُمۚ بَلۡ أَكۡثَرُهُمۡ لَا يُؤۡمِنُونَ ﴿١٠٠﴾ وَلَمَّا جَآءَهُمۡ رَسُولٞ مِّنۡ عِندِ ٱللَّهِ مُصَدِّقٞ لِّمَا مَعَهُمۡ نَبَذَ فَرِيقٞ مِّنَ ٱلَّذِينَ أُوتُواْ ٱلۡكِتَٰبَ كِتَٰبَ ٱللَّهِ وَرَآءَ ظُهُورِهِمۡ كَأَنَّهُمۡ لَا يَعۡلَمُونَ ﴿١٠١﴾ وَٱتَّبَعُواْ مَا تَتۡلُواْ ٱلشَّيَٰطِينُ عَلَىٰ مُلۡكِ سُلَيۡمَٰنَۖ وَمَا كَفَرَ سُلَيۡمَٰنُ وَلَٰكِنَّ ٱلشَّيَٰطِينَ كَفَرُواْ يُعَلِّمُونَ ٱلنَّاسَ ٱلسِّحۡرَ وَمَآ أُنزِلَ عَلَى ٱلۡمَلَكَيۡنِ بِبَابِلَ هَٰرُوتَ وَمَٰرُوتَۚ وَمَا يُعَلِّمَانِ مِنۡ أَحَدٍ حَتَّىٰ يَقُولَآ إِنَّمَا نَحۡنُ فِتۡنَةٞ فَلَا تَكۡفُرۡۖ فَيَتَعَلَّمُونَ مِنۡهُمَا مَا يُفَرِّقُونَ بِهِۦ بَيۡنَ ٱلۡمَرۡءِ وَزَوۡجِهِۦۚ وَمَا هُم بِضَآرِّينَ بِهِۦ مِنۡ أَحَدٍ إِلَّا بِإِذۡنِ ٱللَّهِۚ وَيَتَعَلَّمُونَ مَا يَضُرُّهُمۡ وَلَا يَنفَعُهُمۡۚ وَلَقَدۡ عَلِمُواْ لَمَنِ ٱشۡتَرَىٰهُ مَا لَهُۥ فِي ٱلۡأٓخِرَةِ مِنۡ خَلَٰقٖۚ وَلَبِئۡسَ مَا شَرَوۡاْ بِهِۦٓ أَنفُسَهُمۡۚ لَوۡ كَانُواْ يَعۡلَمُونَ ﴿١٠٢﴾ وَلَوۡ أَنَّهُمۡ ءَامَنُواْ وَٱتَّقَوۡاْ لَمَثُوبَةٞ مِّنۡ عِندِ ٱللَّهِ خَيۡرٞۖ لَّوۡ كَانُواْ يَعۡلَمُونَ ﴿١٠٣﴾﴾

---

[1] مسلم /١/٥٣٤ ص٨٢.

[2] فتح الباری/١١/٣٤٨.

**نیشانەکانی پێغەمبەریەتی موحەمەد(ﷺ)**

خودای گەورە ئەفەرموێت: ﴿وَلَقَدْ أَنزَلْنَآ إِلَيْكَ ءَايَٰتٍۭ بَيِّنَٰتٍۖ وَمَا يَكْفُرُ بِهَآ إِلَّا ٱلْفَٰسِقُونَ﴾ دیارە ئێمە چەندین نیشانەی ئاشکرامان بۆ تۆ ناردووە، ئەوانەی حاشای لێدەکەن، هەر لە ڕێ لادەرەکانن.

ئیمام ئەبو جەعفەری کوڕی جەریر لەم ئایەتەدا: ﴿وَلَقَدْ أَنزَلْنَآ إِلَيْكَ ءَايَٰتٍۭ بَيِّنَٰتٍۖ﴾ ئێمە چەند نیشانەی ئاشکرامان بۆتۆ ناردووە. وتی: یانی ئەی موحەمەد(ﷺ)! ئێمە چەندین بەڵگە و نیشانەی ئاشکرامان بۆ تۆ ناردووە لەسەر ئەوە کە تۆ پێغەمبەری، ئەو نیشانانەش دەربارەی ئەو نهێنیانەی جوولەکە خۆیان لێی ئاگادارن، وە ئەو هەموو دەنگ و باسە داپۆشراوو نەهێنیانە و هەواڵی پێشینەکانی نەوەی ئیسرائل گشتی لە قورئاندا هاتووە، وە هەواڵی ئەوەی لە کتێبەکانی ئەواندایە جگە لەزاناو خوێندەوارەکانیان نایزانن. کە پێشینەو پاشینەکانیان دەستکاریان کردووە و گۆڕیویانە لەو فەرمانانەی کە درابوو بەسەریاندا لە تەوراتا. خودای مەزن لە کتێبەکەیدا کە قورئانە ناردوویەتی بۆ پێغەمبەرەکەی موحەمەد(ﷺ) ئاگاداری داوە و ڕونی کردوەتەوە، ئەو نیشانە ئاشکرانەش کە ناردویەتی هەر فەرمانی خودا خۆیەتی. هەرکەسێ وشیارانە بە خۆیدا بچێتەوە و حەسوودی و لاساری وازی لێبێنێ بەرەو لە ناچونی نەبات. کە سروشتی گشت خاوەن سروشتێکی پاك و تەواوە بڕواکردن بە وێنەی ئەوەی کە موحەمەد(ﷺ) پێی ڕەوانە کراوە، بەو نیشانە ئاشکرانەوە کە باس کراوە، بێئەوەی لەهیچ کەسێکەوە فێرکرابێ و هیچ لەو نیشانەی لە ئادەمی وەرنەگرتووە. وەك زەحاك لە ئیبنو عەباسەوەئەڵێت: ﴿وَلَقَدْ أَنزَلْنَآ إِلَيْكَ ءَايَٰتٍۭ بَيِّنَٰتٍ﴾ ئێمە چەندین نیشانەی ئاشکرامان بۆتۆ ناردووە. ئەڵێت: خودای مەزن بە پێغەمبەر(ﷺ) ئەفەرموێت: تۆ ئەو نیشانانە بەسەریاندا دەخوێنیتەوە، بەیانیان و ئێواران هەموو کاتێ ئاگاداریان دەکەی، وە تۆ نەخوێندەوارێ و نازانی بنوسی و بخوێنیتەوە، هەواڵیان پێئەدەیت بەوەی لە تەوراتایە و لەبەردەستیاندایە وەك چۆن لە تەوراتا هاتووە. خودای گەورە ئەفەرموێت: ئەوە پەندو ئامۆژگاری و ڕوونکردنەوەیە و بەڵگەو نیشانەیشە ئەگەر بزانن[1].

**پەیمان شکێنی لە سروشتی جوولەکەیە**

خودای گەورە ئەفەرموێت: ﴿أَوَكُلَّمَا عَٰهَدُوا۟ عَهْدًا نَّبَذَهُۥ فَرِيقٌ مِّنْهُمۚ بَلْ أَكْثَرُهُمْ لَا يُؤْمِنُونَ﴾ باشە بۆچی هەرجارێك پەیمان لەگەڵ خودا دەبەستن، هەندێك هەر لەناو ئەواندا دێن هەڵی دەوەشێننەوە، زۆرینەشیان هەر باوەڕی پێناهێنن. مالکی کوڕی سەیف ئەڵێت: کاتێ کە پێغەمبەری

---

[1] الطبری /٢/٢٣٧ ص٨٣.

خودا(ﷺ) ڕەوانەکرا، ئەو پەیمانەی کە لێیان وەرگیرابوو وەبیری هێنانەوە، وە ئەوپەیمانەشی لێیان وەرگیرابوو دەربارەی موحەمەد(ﷺ)وتیان: سوێند بە خوا لەبارەی موحەمەدەوە(ﷺ)هیچ پەیمانێکمان لێ وەر نەگیراوە هیچ پەیمانێکی تریشمان لێوەرنەگیراوە. خودای گەورە ئەم ئایەتەی ناردە خوارەوە: ﴿أَوَكُلَّمَا عَٰهَدُواْ عَهۡدٗا نَّبَذَهُۥ فَرِيقٞ مِّنۡهُمۚ﴾[1] باشە بۆچی هەرجارێ پەیمانێ لەگەڵ خوا دەبەستن، هەندێك هەر لەناو ئەواندا دێن هەڵی دەوەشێننەوە. حەسەنی بەسری ئەڵێت: لەم دەقەدا کە خودای گەورە ئەفەرموێت: ﴿بَلۡ أَكۡثَرُهُمۡ لَا يُؤۡمِنُونَ﴾ بەڵکو زۆرینەشیان هەر باوەڕی پێناهێنن. بەڵێ، لەسەر زەمینا هیچ پەیمانێ نەبووە کە بەستبێتیان مەگین هەڵیان وەشاندۆتەوە پشت گوێیان خستووە، ئەمڕۆ پەیمان ئەدەن و بەیانی هەڵی دەوەشێننەوە[2].

## جوولەکە وازیان لە کتێبی خودا هێنا و ڕوویان لە جادووگەری کرد

خودای گەورە ئەفەرموێت: ﴿وَلَمَّا جَآءَهُمۡ رَسُولٞ مِّنۡ عِندِ ٱللَّهِ مُصَدِّقٞ لِّمَا مَعَهُمۡ نَبَذَ فَرِيقٞ مِّنَ ٱلَّذِينَ أُوتُواْ ٱلۡكِتَٰبَ كِتَٰبَ ٱللَّهِ وَرَآءَ ظُهُورِهِمۡ كَأَنَّهُمۡ لَا يَعۡلَمُونَ﴾ دوای ئەوەی ئەم پێغەمبەرە خودا ناردویەتیە ناویان، بڕوای بەو کتێبەش هەیە کە لەلایانە، دیسان هەندێك لەوانەی ئەهلی کتێب، لە کتێبی خودا خۆ لا ئەدەن و ڕوی تێناکەن، هەر دەڵێی نەشیان زانیووە. سوددی ئەڵێت: کاتێ کە موحەمەدیان(ﷺ) بۆ ڕەوانە کرا، بە تەورات دژی وەستان و بەرانگاری بوونەوە، کە تەورات و قورئان ڕێکەوتن، وازیان لە تەورات هێنا و پشت گوێیان خست. کاریان بە کتێبی ئاسەف و جادووی هاروت و ماروت کرد کە لەگەڵ قورئان ڕێکنەدەکەوت، بۆیە خودای گەورە ئەفەرموێت: ﴿كَأَنَّهُمۡ لَا يَعۡلَمُونَ﴾ هەر دەڵێن نەشیان زانیوە[3]. قەتادە لەم دەقەدا کە خوای گەورە ئەفەرموێت: ﴿كَأَنَّهُمۡ لَا يَعۡلَمُونَ﴾هەر دەڵێن نەشیان زانیوە، ئەڵێت: ئەوانە دەیانزانی، بەڵام ئەو زانیاریانەی خۆیان پشت گوێ خستبوو، شاردبویانەوەو حاشایان لێکردبوو[4].

---

[1] الطبری /٢/٤٠٠ ص٨٣.

[2] ابن ابی حاتم /١/٢٩٥.

[3] الطبری /٢/٤٠٤.

[4] الطبری /٢/٤٠٤.

**ئەو جادووگەریە لە پێش سەردەمی سولەیمان بوو سەلامی خوای لێبێ**

خوای گەورە ئەفەرموێت: ﴿وَٱتَّبَعُواْ مَا تَتْلُواْ ٱلشَّيَٰطِينُ عَلَىٰ مُلْكِ سُلَيْمَٰنَ وَمَا كَفَرَ سُلَيْمَٰنُ وَلَٰكِنَّ ٱلشَّيَٰطِينَ كَفَرُواْ يُعَلِّمُونَ ٱلنَّاسَ ٱلسِّحْرَ﴾ کەوتونەتە شوێن ئەو شتانەی شەیاتینیەکان لە زەمانی پاشایەتی سولەیماندا دەیان خوێندەوە، سولەیمان خوانەناس نەبوو، شەیاتین خوانەناس بوون، خەڵکیان فێری جادوو دەکرد. سوددی لەم ئایەتەدا: ﴿وَٱتَّبَعُواْ مَا تَتْلُواْ ٱلشَّيَٰطِينُ عَلَىٰ مُلْكِ سُلَيْمَٰنَ﴾ ئەڵێت: شەیاتیەنەکان بەرەو ئاسمان سەردەکەوتن، لەو شوێنانەدا دادەنیشتن کەقسەی لێدەبیستراو، گوێیان لە قسەی فریشتەکان دەگرت دەربارەی ئەو شتانە لە سەر زەمینا ڕوو ئەدەن لە مردن و شتی نادیار یان هەرشتێکی تر، دەهاتنە لای جادوو گەرەکان و بۆیان دەگێڕانەوە جادوو گەرەکانیش باسیان دەکرد بۆ خەڵکی، خەڵکیش سەیریان دەکرد قسەکەی ئەوان بوو، کاتێ کە جادوو گەرەکان متمانەیان پێدان، درۆشیان بۆ دەکردن و شتی تری زۆریان تێکەڵاو دەکرد لەگەڵ هەر قسەیەکدا حەفتا قسەیان بۆ زیاد دەکرد. خەڵکیش ئەو قسانەیان لە کتێبدا دەنوسی لەناو نەوەی ئیسرائل دەنگ و باس بڵاو بۆوە، کە جنۆکە غەیب دەزانن، سولەیمان لە ناو خەڵکا هەموو ئەو کتێبانەی کۆکردەوەو لە سنوقێکا داینا، پاشان لە ژێر کورسیەکەیدا کردی بە ژێر خۆڵەوە، هیچ شەیتانێ نەیدەتوانی نزیکی ئەو کورسیە ببێتەوە، کە نزیکی ببوایەتەوە دەسوتا. سولەیمان وتی: گوێم لە قسەی هەرکەسێ ببێ بڵێ شەیتانیەکان شتی نادیار دەزانن ئەدەم لە ملی و دەیکوژم. کاتێ کە سولەیمان مرد، ئەو زانایانەش کە شارەزا بوون لە کارەکانی سولەیمان مردن. دوای ئەوان کۆمەڵێ هاتن. شەیتان خۆی خستە شێوەی مرۆڤێك و هاتە لای چەند کەسێك لە نەوەی ئیسرائیل و پێی وتن: ئایا ڕێگەتان نیشان بدەم بۆ گەنجینەیەك کە هەرگیز تەواوی ناکەن و نایخۆن؟ وتیان: بەڵێ، وتی: ژێر کورسیەکەی سولەیمان هەڵکۆڵن، لەگەڵیان ڕۆشت شوێنەکەی پیشان دان و لە کەناریانا وەستا، پێیان وت: تۆش نزیك بەرەوە، وتی: نەخێر، من لێرەدا لەلاتان دەبم، ئەگەر نەتان دۆزیەوە من بکوژن. هەڵیان کۆڵی و کتێبەکانیان دۆزیەوە. کاتێ کە دەریان هێنا، شەیتان وتی: بێگومان سولەیمان بەم جادووە مرۆ و شەیاتین و باڵندەکانی خستبوە ژێر دەستی خۆی. پاشان فڕی و ڕۆشت، لەناو خەڵکا دەنگ و باس بڵاو بۆوە کە سولەیمان جادووگەر بووە. نەوەی ئیسرائیل ئەو کتێبانەیان هەڵگرت، کاتێ کە موحەمەد(ﷺ) هات بەو کتێبانە کێشەیان لەگەڵ دەکرد. تا خودای مەزن ئەم ئایەتەی ناردە خوارەوە کە ئەفەرموێت: ﴿وَمَا كَفَرَ سُلَيْمَٰنُ وَلَٰكِنَّ ٱلشَّيَٰطِينَ كَفَرُواْ﴾ سولەیمان خوانەناس نەبوو،شەیاتین خوا نەناس بون،

## بەسەرهاتی هاروت وماروتو تەفسیری دوو فریشتەکە

خودای گەورە ئەفەرموێت: ﴿وَمَآ أُنزِلَ عَلَى ٱلْمَلَكَيْنِ بِبَابِلَ هَـٰرُوتَ وَمَـٰرُوتَ ۚ وَمَا يُعَلِّمَانِ مِنْ أَحَدٍ حَتَّىٰ يَقُولَآ إِنَّمَا نَحْنُ فِتْنَةٌ فَلَا تَكْفُرْ ۖ فَيَتَعَلَّمُونَ مِنْهُمَا مَا يُفَرِّقُونَ بِهِۦ بَيْنَ ٱلْمَرْءِ وَزَوْجِهِۦ﴾ ئەو زانستەش کە هاتبوە سەر هاروت وماروت کە دوو فریشتە بوون لە بابلدا، هەر کەسێکیان فێری جادوو بکردایە، پێشەکی تێیان دەگەیاندن، ئێمە هەر بۆ تاقی کردنەوەین، نەکەی خودات لە بیر بچێ، هەر ئەوەندەیان لێفێر دەبوون ژن و مێرد لێك جیاکەنەوە. خەڵکی ڕای جیاوازیان هەیە لێرەدا، هەندێ دەڵێن: (ما) نافیەیە بەمانای (التی) هاتووە، لەم دەقەدا کە خودای گەورە ئەفەرموێت: ﴿وَمَآ أُنزِلَ عَلَى ٱلْمَلَكَيْنِ﴾ قورتوبی ئەڵێت: (ما) نافیەیە مەعتوفە لەسەر ئەم دەقە کە خودای مەزن ئەفەرموێت: ﴿وَمَا كَفَرَ سُلَيْمَـٰنُ﴾ پاشان دەفەرموێت: ﴿وَلَـٰكِنَّ ٱلشَّيَـٰطِينَ كَفَرُوا۟ يُعَلِّمُونَ ٱلنَّاسَ ٱلسِّحْرَ وَمَآ أُنزِلَ عَلَى ٱلْمَلَكَيْنِ﴾ شەیاتینی خوا نەناس بوون خەڵکیان فێری جادوو دەکرد. چونکە جوولەکەکان دەیان وت: جوبرەئیل و میکائیل ئەوەیان هێناوە، خودایش بە درۆی خستنەوە. ئەم دەقە خودای مەزن ئەفەرموێت: ﴿هَـٰرُوتَ وَمَـٰرُوتَ﴾ بوەتە بەدەل لە شەیاتین وئەڵێت: ئەوە شتێکی ڕاستە، چونکە بۆ دوانیش جەمع بەکار دەهێنرێ، وەك خودای مەزن فەرمویەتی: ﴿فَإِن كَانَ لَهُۥٓ إِخْوَةٌ﴾[1] ئەگەر مردوەکە چەند برایەکی هەبوو، یان لەبەر ئەوەی شوێن کەوتویان هەبوو، یان لەناویاندا باسکراوە لەبەر یاخی بونیان قسەکە بەم شێوەیەی لێ دێ لەلای: هارووت وماووت خەڵکیان فێری جادوو دەکرد لە بابل، پاشان وتی: ئەمە باشترە کە ئایەتەکە پشتگیری لێدەکا و ڕاست ترە، گوێ بە هیچ شتێکی تر جگە لەمە نادرێ. ئیبنو جەریر ڕیوایەتی کردووە لە ڕێگەی عەوفیەوە لە ئیبنو عەباسەوە لەم دەقەدا کە خودای مەزن ئەفەرموێت: ﴿وَمَآ أُنزِلَ عَلَى ٱلْمَلَكَيْنِ بِبَابِلَ﴾ ئەوی نێراوەتە خوارەوە بۆ سەر ئەو دوو فریشتەیە. دەڵێ: خودا جادووی نە ناردۆتە خوارەوە[2]. سەنەدەکەیش لە ڕەبیعی کوڕی ئەنەسەوە بووە، لەم دەقەدا کە خودای مەزن ئەفەرموێت: ﴿وَمَآ أُنزِلَ عَلَى ٱلْمَلَكَيْنِ﴾ ئەڵێت: خودا جادووی بۆ نەناردونەتە خوارەوە[3]. ئەو کاتە مەبەست بە دوو فریشتەکە جوبرەئیل و میکائیلە سەلامی خوایان لێبێ چونکە جادووگەرە جوولەکەکان وەك باس کراوە وتویانە خودا جادووی ناردۆتە خوارەوە لەسەر

---

[1] القرطبي /٢/٥٠ ص٨٣.
[2] الطبري /٢/٤١٩ ص٨٤.
[3] الطبري /٢/٤١٩.

زەمانی جویبرەئیل و میکائیل بۆ سولەیمانی کوڕی داود، خودا بە درۆی خستونەتەوە بەوەی پێغەمبەرەکەی موحەمەدی (ﷺ) ئاگادار کردەوە کە جویبرەئیل و میکائیل جادوویان دانەبەزاندوەتە خوارەوە. سولەیمانیش سەلامی خوای لێبێ بێ ئاگایی خۆی دەربڕیوە لەوەی داویانەتە پاڵی لەو جادووە. هەواڵیشی پێداون کە ئەو جادووە لە کردلری شەیاتینەکانە، کە لە بابل خەڵکیان فێری جادوو دەکرد. ئەوانەش کە فێریان دەکردن دوو پیاو بوون: یەکێکیان ناوی هارووت بوە ئەوی تریشیان ناوی ماروووت بوە. هاروت و مارووت بە پێی ئەم تەئویلە قسەو باسێکە خەڵکی وتویانە و وەلام دانەوەیەکیشە بۆ ئەوان[١]. ئەم تەئویلەش دیارو ئاشکرایە کە تەکەلوفێکی زۆری تێدایە. زۆرێ لە زانایانی پێچشینە وتویانە هارووت ومارووت دوو فریشتە بوون لە ئاسماندا، هەردووکیان ڕەوانە کران بۆ سەر زەمین و ئەوەی کە کردیان لە زەمینا کردیان، بۆیە ڕێکخستنی نێوان ئەمە و نێوان ئەو بەڵگانە لەسەر بێگوناهی فریشتەکان شتێکە و خودا خۆی لێی ئاگادار بووە دەربارەی ئەم دوانەو تایبەت بووە بەمانەوە، هیچ دژایەتیەکی تێدا نیە، وەکو چۆن خودا لە پێشا ئاگاداری کاری شەیتان بووە و لە ڕیزی فریشتەکان بووە. وەك ئەفەرموێت: ﴿ وَإِذْ قُلْنَا لِلْمَلَٰٓئِكَةِ ٱسْجُدُوا۟ لِءَادَمَ فَسَجَدُوٓا۟ إِلَّآ إِبْلِيسَ أَبَىٰ ﴾ فەرمانمان بە فریشتەکاندا سوژدە لەبەر ئادەم بەرن جگە لە ئیبلیس هەموویان سوژدەیان بۆ برد، ئەو سوژدەی نەبرد. چەندین ئایەتی تریش کە بەڵگەن لەسەر ئەوە. لەگەڵ ئەوەیشا بەسەرهاتی هارووت و مارووت زۆر سووك و ئاسان ترە لە بەسەرهاتی شەیتان نەفرینی خودای لێبێ. قورتوبیش ئەمەی گێڕاوەتەوە لە عەلی و ئیبنو مەسعودو ئیبنو عەباس و ئیبنو عومەر و کەعبە ئەحبار و سوددی و کەلبیەوە. بەلام بەسەرهاتەکەی زوهرەگومانی تێدا نیە هەڵبەستراو دروستکراوە[٢]. شوێنەوار ناسان وتویانە: ئەو دوریەی نێوان بابل کە بەشێکە لە هەرێمی عیراق، لە دەریای موحیتی غەربی کە پێی دەوترێ ئۆقیانوس حەفتا پلەیە، بە درێژی و پانیەکەشی دووری نێوان ناوەڕاستی زەمینە لەلای باشورەوە کە پەیوەستە بە هێڵی ناوەڕاستەوە بە سی و دوو پلە، والله أعلم.

### فێربوونی جادوو خوانەناسیە (کفر)

خودای گەورە ئەفەرموێت: ﴿وَمَا يُعَلِّمَانِ مِنْ أَحَدٍ حَتَّىٰ يَقُولَآ إِنَّمَا نَحْنُ فِتْنَةٌ فَلَا تَكْفُرْ﴾ هەرکەسێکیان فێری جادوو بکردایە، لە پێشا پێیان ڕادەگەیاند، ئێمە هەر بۆ تاقی کردنەوەین. نەکەن خوداتان لە بیر بچێ. ئەبو جەعفەری ڕازی ئەڵێت: لە ڕەبیعی کوڕی ئەنەسەوە لە قەیس کوڕی عەبادەوە لە ئیبنو عەباسەوە ئەڵێت: ئەگەر کەسێ بهاتایە بۆ لاتان حەزی لە جادوو گەری بکردایە، زۆر هەوڵیان لەگەڵ

---

[١] الطبری /٢/٤١٩ ص٨٤.

[٢] القرطبی /٢/٥١.

ئەدا کە خۆی فێری جادوو نەکاو پێیان دەوت، ئێمە بۆ تاقی کردنەوەین خۆت بێدین مەکە، چونکە ئەم دوو فریشتە شارەزای چاکە و خراپە و بێ دینی و باوەڕ بوون، دەیان وت کە جادوو لە خوانەناسیە. وتی: ئەگەر هەر وازیان لێ نەهێنانایە، فەرمانیان بەو کەسە دەکرد بێتە فلان و فلان شوێن، کاتێ کە دەهاتنە ئەو شوێنە شەیتانی دەبینی و فێری دەکرد. کاتێ کە فێری دەکرد ڕوناکیەکی لێوە دەردەچوو. سەیری دەکرد لەناو ئاسماندا دەدرەوشایە وە و دەی وت: ئەی هاوارو داخ و پەژارە بۆ من! من خەریکی چیم[1]. وە لەحەسەنی بەسریەوە لە تەفسیری ئەم ئایەتەدا ئەڵێت: بەڵێ ئەم دوو فریشتەیە ڕەوانە کران بە جادووەوە، بۆ ئەوەی خەڵکی فێری ئەو بەڵایە بکەن کە خودا ویستی خەڵکی پێتاقی بکاتەوە. بەڵێنیشی لێوەرگرتن هیچ کەسێ فێری ئەو جادووە نەکەن تا پێی دەڵێن. ئێمە هەر بۆ تاقی کردنەوەین نەکەن خوداتان لە بیر بچێ[2]. ئیبنو ئەبی حاتەم ڕیوایەتی کردووە. قەتادە ئەڵێت: پەیمانیان لێوەرگیرابوو کە هیچ کەسێ فێری جادوو نەکەن تا پێی دەڵێن: ئێمە بۆ تاقی کردنەوەین نەکەن خوداتان لە بیر بچێ. واتە: بەڵایەکە و پێی تاقی دەکرێنەوە. نەکەن خوداتان لە بیر بچێ[3]. سوددی ئەڵێت: کاتێ کە مرۆڤێ بهاتایە بۆ لایان ئارەزوی جادووگەری بکردایە، ئامۆژگاریان دەکردو پێیان دەوت: ئەو خۆڵە مێشە بێنە و میزی پێدا بکە،کاتێ کە میزی پێدا دەکرد ڕوناکیەکی لێوە دەر دەچوو، بەرز دەبووەوە تا دەچوە ئاسمان، ئەویش بڕوا بوو، شتێکی ڕەش بەرەو ڕوی دەهات تا دەچووە ناو گوێی، ئەوەیش غەزەبی خودا بوو، کاتێ کە هەواڵی بدایە بە دوو فریشتەکە بەوە، فێری جادوویان دەکرد. ئەمەیش ئەوەیە کە خودای گەورە ئەفەرموێت: ﴿وَمَا يُعَلِّمَانِ مِنْ أَحَدٍ حَتَّىٰ يَقُولَا إِنَّمَا نَحْنُ فِتْنَةٌ فَلَا تَكْفُرْ﴾[4] هەرکەسێکیان فێری جادوو بکردایە لە پێشا پێیان دەوت: ئێمە هەر بۆ تاقی کردنەوەین، نەکەن خوداتان لە بیر بچێ. سونەید ئەڵێت: لە حەجاجەوە لە ئیبنو جورەیجەوە لەم ئایەتەدا: خوانەناس نەبێ هیچ کەسێ ناوێرێ جادووگەری بکا. ئەو بەڵایشە تەنیا بۆ تاقی کردنەوەو چەرمەسەرییە[5]. ئەم ئایەتە کراوە بە بەڵگە لەسەر بێدین بوونی کەسێ کە خۆی فێری جادوو بکا،ئەم فەرمودەیەش هەر بە بەڵگە هێنراوەتەوە کە حافیز ئەبو بەکری بەزار ڕیوایەتی کردووە لە عەبدوڵلاوە ئەڵێت: هەرکەسێ چووە لای فاڵچیەك یان جادووگەرێ، ئەوەی دەیڵێت بە ڕاستی زانی، ئەوە بڕوای

---

[1] ابن ابی حاتم /١/٣١٢ ص٨٥.

[2] ابن ابی حاتم /١/٣١٠.

[3] الطبری /٢/٤٤٣.

[4] الطبری /٢/٤٤٣.

[5] الطبری /٢/٤٤٣.

نەماوە بەوەی کە بۆ موحەمەد(ﷺ) رەوانە کراوە[1]. ئەم فەرموودە سەنەدەکانی راستن، نموونەی تریش لەسەری هاتووە.

### هەر بە جادوو ژن و مێرد لە یەکتر جیا دەکرێنەوە

خودای گەورە ئەفەرموێت: ﴿فَيَتَعَلَّمُونَ مِنْهُمَا مَا يُفَرِّقُونَ بِهِۦ بَيْنَ ٱلْمَرْءِ وَزَوْجِهِۦ﴾ هەر ئەوەندەیان لێ فێر بوون ژن و مێرد لەیەك جیا بکەنەوە، واتە: خەڵکی لە هارووت و مارووتەوە فێری زانیاری جادوو بوون، ئەو جادووەیان لە کردارە خراپ و ناشیرینانە بوو کە پێی هەڵدەستان، بۆ ئەوە بوو بەو جادووەیان ژن و مێرد لەیەکتری جیا بکەنەوە، کە پێکەوە دەژیان و تەمەنیان بەسەر دەبرد، ئەمە لە کردارەکانی شەیتان بوو، وەك موسلیم ڕیوایەتی کردووە لە سەحیحەکەیدا لە جابیری کوڕی عەبدللاوە لە پێغەمبەرەوە(ﷺ) کە فەرمویەتی: شەیتان تەختەکەی لەسەر ئاو دادەنێ، پاشان پۆلەکانی دەنێرێ بۆ ناو خەڵکی، نزیکترینیان لەلای لە پلەدا، ئەوانەیانە لەلای کە فیتنەی زیاتر بێ، کەسی وایان دێتە لای و دەڵێت: بەردەوام وازم لە فلان نەهێناوە، تا کە لێی دوورکەوتومەتەوە ئاواو ئاوا دەڵێت، ئیبلیس دەڵێ: نەخێر سوێند بە خوا هیچ کارێکت نەکردووە. کەسی واشیان دێتە لای و دەڵێت: وازم لێنەهێناوە تا جیابوونەوەم پەیدا کردووە لە نێوان خۆی و خێزانەکەیدا، دەڵێ: نزیکی بکەنەوەو بێنن و دەیگرێ بە خۆیەوە و ئەڵێت: تۆ زۆر چاکی[2]. هۆی جیاکردنەوەی ژن و مێرد بە جادوو، وا دەکا بە پیاو یان ژنەکە لەبەر چاوی ناشیرین بێ یان هەڵسوکەوتی خراپ بێت، یان ڕق و کینە دەخاتە دڵی یان ئەو هۆکارانەی کە دەبنە هۆی جیابوونەوە. وتەی (المرء) بەکار دێت بۆ پیاو. موئەنەسەکەیشی (أمراۃ)هەردوکیان دەکرێن بە موسەنا بەڵام ناکرێ بە جەمع، و الله أعلم.

### بڕیاری خوا لەسەرو هەموو شتێکەوەیە

خودای گەورە ئەفەرموێت: ﴿وَمَا هُم بِضَآرِّينَ بِهِۦ مِنْ أَحَدٍ إِلَّا بِإِذْنِ ٱللَّهِ﴾ کە توانای ئەوەیان نەبووبێ ئیزنی خودا زیان لە هیچ کەس بدەن. سوفیانی سەوری ئەڵێت: مەگین بە فەرمانی خودا[3].

حەسەنی بەسری ئەڵێت: ﴿وَمَا هُم بِضَآرِّينَ بِهِۦ مِنْ أَحَدٍ إِلَّا بِإِذْنِ ٱللَّهِ﴾ بەم جادووە ناتوانن زیان بەکەس بگەیەنن مەگین بە ئیزنی خودا. بەڵێ هەرکەسێ خودا ویستی لێبێ زاڵیان دەکا بەسەریدا، هەرکەسێ خودا ویستی لێ نەبێ زاڵ نابێ بەسەریدا، ناتوانن زیان بە هیچ کەسێ بگەیەنن بە ویستی

---

[1] کشف الاثار /٢/٤٤٣ ص٨٥ مەوقوفی سەحیحە.

[2] مسلم /٤/٢١٦٧.

[3] ابن ابی حاتم /١/٣١٢ ص٨٥.

خودا نەبێ وەك خودای گەورە ئەفەرموێت: ﴿وَيَتَعَلَّمُونَ مَا يَضُرُّهُمْ وَلَا يَنفَعُهُمْ ﴾[1] هەر شتێكی وا فێر دەبون كە زیان لە خەڵك بدا و بۆ خۆیان هیچ سودێكی نەبێ، واتە: زیانی بۆ ئاینی خۆیان هەیە،ئەوەندە سودیان پێنا گەیەنێ بەرامبەری ئەو زیانە بێ كە لێیان دەكەوێ: ﴿وَلَقَدْ عَلِمُوا لَمَنِ اشْتَرَاهُ مَا لَهُ فِي الْآخِرَةِ مِنْ خَلَاقٍ﴾ ئای ئەگەر تێبگەیشتنایە، دەیانزانی چۆن خۆیان خراپ فرۆشت. ئەمانە ئەگەر بڕوایان بە خودا بوایە و پارێزگار بونایە، دەیانزانی پاداشتی چاكتر لەلای خودایە.

﴿وَلَبِئْسَ ﴾ ئەو شتە خراپە كە جادوو گەری بوو گۆڕیانەوە بە باوەڕ بە خودا و شوێن كەوتنی پێغەمبەر (ﷺ) ئەگەر شارەزاییان بوایە و پەندیان لەو ئامۆژگاریان وەربگرتایە پاداشتی چاكیان دەبوو: ﴿وَلَبِئْسَ مَا شَرَوْا بِهِ أَنفُسَهُمْ لَوْ كَانُوا يَعْلَمُونَ ﴿١٠٢﴾ وَلَوْ أَنَّهُمْ آمَنُوا وَاتَّقَوْا لَمَثُوبَةٌ مِّنْ عِندِ اللَّهِ خَيْرٌ لَّوْ كَانُوا يَعْلَمُونَ ﴾ ئەگەریەڕاستی ئەوان بڕوایان بهێنایە و پارێزگار بونایە ئەوا پاداشتی چاكتر لەلایەن خوداوە بۆ ئەوان دەبوو. ﴿وَلَوْ أَنَّهُمْ آمَنُوا وَاتَّقَوْا لَمَثُوبَةٌ مِّنْ عِندِ اللَّهِ﴾ واتە: ئەگەر بڕوایان بە خودا وپێغەمبەرەكەی (ﷺ)و خۆیان لە قەدەغە كراوەكانی خودا بپاراستایە، پاداشتی چاكتر لەلایەن خوداوە بۆ ئەوان دەبوو، لەوەی ئەوان بۆخۆیان هەڵبژاردو پێی ڕازی بوون. وەك خودای مەزن لە ئایەتێكی ترا ئەفەرموێت: ﴿ وَقَالَ الَّذِينَ أُوتُوا الْعِلْمَ وَيْلَكُمْ ثَوَابُ اللَّهِ خَيْرٌ لِّمَنْ آمَنَ وَعَمِلَ صَالِحًا وَلَا يُلَقَّاهَا إِلَّا الصَّابِرُونَ ﴾[2] ئەوانەی كە زانیاریان پێدرابوو دەیان وت: هەی ماڵ وێران! هەركەسێ باوەڕی بە خودا هەبێت و ئاكاری چاك بێ، ئەو خەڵاتەی خودا دەیداتێ زۆر چاكترە و ئەو خەڵاتەش هەر بەشی خۆڕاگرانە.

﴿ يَا أَيُّهَا الَّذِينَ آمَنُوا لَا تَقُولُوا رَاعِنَا وَقُولُوا انظُرْنَا وَاسْمَعُوا وَلِلْكَافِرِينَ عَذَابٌ أَلِيمٌ ﴿١٠٤﴾ مَّا يَوَدُّ الَّذِينَ كَفَرُوا مِنْ أَهْلِ الْكِتَابِ وَلَا الْمُشْرِكِينَ أَن يُنَزَّلَ عَلَيْكُم مِّنْ خَيْرٍ مِّن رَّبِّكُمْ وَاللَّهُ يَخْتَصُّ بِرَحْمَتِهِ مَن يَشَاءُ وَاللَّهُ ذُو الْفَضْلِ الْعَظِيمِ ﴿١٠٥﴾ ﴾

**ئەدەب لە هەڵبژاردنی قسە كردندا**

خودای گەورە ئەفەرموێت: ﴿ يَا أَيُّهَا الَّذِينَ آمَنُوا لَا تَقُولُوا رَاعِنَا وَقُولُوا انظُرْنَا وَاسْمَعُوا وَلِلْكَافِرِينَ عَذَابٌ أَلِيمٌ ﴾ ئەی ئەوانەی بڕواتان هێناوە! ئێوە مەڵێن: ﴿رَاعِنَا ﴾ بڵێن:

---

[1] ابن ابی حاتم /١/٣١١.

[2] قصص ٨٠.

چاوەڕوانیمان لەسەر بکە (تەماشامان بکە)و ببیستن، بۆ ئەو خوانەناسانە سزای زۆر بەژان هەیە. خودای مەزن ڕێگری کردووە لە بەندە خاوەنباوەڕەکانی کە چاولێکەری لە خوانەناسان نەکەن لە جێگە و هەڵسو کەوتیاندا، چونکە جوولەکەکان کە قسەیان دەکرد، بە شێوەیە دەیان کرد کە مانایەکی ترش هەڵگرێ، مەبەستیان سوکایەتی پێکردن بوو، بەرنەفرینی خودا کەون. کاتێ کە بیان ویستایە بڵێن: گوێمان لێبگرە دەیان وت: ﴿رَٰعِنَا﴾ مەبەستیان بە (الرعونە)ئەوە بووە کە خودای گەورە ئەفەرموێت: ﴿مِّنَ ٱلَّذِينَ هَادُواْ يُحَرِّفُونَ ٱلْكَلِمَ عَن مَّوَاضِعِهِۦ وَيَقُولُونَ سَمِعْنَا وَعَصَيْنَا وَٱسْمَعْ غَيْرَ مُسْمَعٍ وَرَٰعِنَا لَيًّۢا بِأَلْسِنَتِهِمْ وَطَعْنًا فِى ٱلدِّينِ ۚ وَلَوْ أَنَّهُمْ قَالُواْ سَمِعْنَا وَأَطَعْنَا وَٱسْمَعْ وَٱنظُرْنَا لَكَانَ خَيْرًا لَّهُمْ وَأَقْوَمَ وَلَٰكِن لَّعَنَهُمُ ٱللَّهُ بِكُفْرِهِمْ فَلَا يُؤْمِنُونَ إِلَّا قَلِيلًا﴾[1] هەندێ کەس لە جوولەکەکان وتاری خودا دەگۆڕن و قسەی تری دەخەنە جێ، بە تۆش دەڵێن بیستمان و گوێمان نەدا، تۆش ببیستە. وەك هەرگیز گوێت لە ئێمە نەبێ، زمانیان لاڵ دەگرن و تانە لە دینت ئەدەن و بەتەشەر دەڵێن: ﴿رَٰعِنَا﴾ ئەگەر ئەمان بیان وتایە بیستمان و بەقسەت دەکەین و لێمان بیستی و دەبێ چاوێکت لێمان بێ، بۆیان چاکترو ڕاستر بوو. بەڵام خودا لەسەر ئەو ڕێ گۆڕینەیان نەفرینی خۆی لێکردوون و لەوانە کەمێکیان نەبێ نایان هەوێ بڕوا بێنن. فەرمودەیش دەربارەیان هاتووە، ئەوانە کاتێ کەسەلامیان بکردایە دەیان وت: (السام علیکم) وتەی (السام) یانی: مردن، هەر بۆیە فەرمانمان پێکرا کە بڵێین: (و علیکم) واتە: خۆتان بمرن. بێگومان بۆ ئێمە قبولێ دەکرا دەربارەی ئەوان، بەڵام بۆ ئەوان قبولێ نەدەبوو دەربارەی ئێمە. مەبەست لێرەدا ئەوەیە خودای مەزن ڕێگری کردووە لە خاوەنباوەڕان کە چاو لە خوانەناسان بکەن لە کردارو گفتاردا و ئەفەرموێت: ﴿يَٰٓأَيُّهَا ٱلَّذِينَ ءَامَنُواْ لَا تَقُولُواْ رَٰعِنَا وَقُولُواْ ٱنظُرْنَا وَٱسْمَعُواْ ۗ وَلِلْكَٰفِرِينَ عَذَابٌ أَلِيمٌ﴾ ئەی ئەوانەی بڕواتان هێناوە! ئێوە مەڵێن: ﴿رَٰعِنَا﴾ بڵێن: چاوەڕوانیمان لەسەر بکە و ببیستن. بۆ ئەو خوانەناسانە سزای زۆر بە ژان هەیە. ئیمامی ئەحمەد ڕیوایەتی کردووە لە ئیبنو عومەرەوە ڕەزای خوای لێبێ ئەڵێت: پێغەمبەری خودا(ﷺ) فەرمویەتی: ڕەوانە کراوم بە شمشێر لەگەڵ هاتنی قیامەتا. تا خودا بە تەنیا بپرسترێ کە شەریکی نیە، ڕۆزیم لە ژێر سێبەری نێزەکەمدا پێدراوە. زەلیلی و بچوکیش بەشی ئەو کەسانەیە کە سەرپێچی فەرمانی منی کردووە، وە هەر کەسێ خۆی بچوێنێ بە کۆمەڵێ ئەوە بێگومان لەوە[2]. ئەم فەرمودە بەڵگەیە لەسەر زۆر بە توندی ڕێگری لێکردن لە خۆ چواندن و هەڕەشە بە سزای سەخت لەو کەسانەی کە چاو لە

---

[1] النساء ٤٦.

[2] احمد /٢/٥٠/حه سه نه ص٨٦.

خوانه‌ناسان ده‌که‌ن له‌ کردا و گفتارو جل و به‌رگ و جه‌ژنه‌کان و عباده‌ته‌کانیاندا و هه‌ر شتێکی تریش که‌ دانه‌نراوه‌ و بڕیاری له‌سه‌ر نه‌دراوه‌ بۆمان له‌و شتانه‌ی ئه‌وانه‌ ده‌یکه‌ن. ئه‌بو داودیش هه‌رڕیوایه‌تی کردوه‌ له‌ ئیبنو عومه‌ره‌وه‌–ڕه‌زای خوایان لێبێ ئه‌ڵێت: پێغه‌مبه‌ری خودا(ﷺ) فه‌رمویه‌تی: هه‌ر که‌سێ خۆی بچوێنێ به‌ گرۆیه‌ك، بێگومان ئه‌و که‌سه‌ له‌وانه‌[1]. زه‌حهاك ئه‌ڵێت: له‌ ئیبنو عه‌باسه‌وه‌: ﴿ يَٰٓأَيُّهَا ٱلَّذِينَ ءَامَنُواْ لَا تَقُولُواْ رَٰعِنَا ﴾ ئه‌ی ئه‌وانه‌ی بڕواتان هێناوه‌! مه‌ڵێن: ﴿رَٰعِنَا﴾وتی: ده‌یان وت به‌ پێغه‌مبه‌ر(ﷺ) (أرعنا) باش گوێمان بده‌رێ تا مه‌به‌ستی خۆمانت پێ ڕاده‌گه‌یه‌نین. به‌ڵام ﴿رَٰعِنَا﴾ وه‌ك ئه‌وه‌یه‌ که‌ ده‌ڵێن: (عاطنا) واته‌: ساویلکه‌ و به‌دکارو خراپ[2]. ئیبنو ئه‌بی حاته‌م ئه‌ڵێت: ڕیوایه‌ت کراوه‌ له‌ ئه‌بولعالیه‌ و ئه‌بو مالیك و ڕه‌بیعی کوڕی ئه‌نه‌س و عه‌تیه‌ی عه‌وفی و قه‌تاده‌وه‌ هه‌ر به‌و جۆره‌[3]. موجاهید ئه‌ڵێت: ﴿لَا تَقُولُواْ رَٰعِنَا﴾ به‌ پێچه‌وانه‌وه‌ مه‌ڵێن[4]. وه‌ له‌ ڕیوایه‌تێکی ترا هاتووه‌: مه‌ڵێن: گوێمان لێبگره‌، ئێمه‌ش گوێ له‌ تۆ ده‌گرین. عه‌تا ئه‌ڵێت: مه‌ڵێن: ﴿رَٰعِنَا﴾ ئه‌مه‌ زمانێك بوو ئه‌نساریه‌کان به‌کاریان ده‌هێنا، خودای مه‌زن قه‌ده‌غه‌ی کرد[5]. سوددی ئه‌ڵێت: پیاوێ له‌ جووله‌که‌کانی به‌نو قه‌ینقاع ناوی ڕه‌فاعه‌ی کوڕی زه‌ید بوو،ده‌هات بۆ لای پێغه‌مبه‌ر (ﷺ) کاتێ که‌ ده‌هاته‌ خزمه‌تی قسه‌ی له‌گه‌ڵ ده‌کرد و ده‌یوت: باش مۆڵه‌تم بده‌، گوێ بگره‌ هه‌رگیز گوێت لێنه‌بێ (أ رعني سمعك و اسمع غير مسمع) مسوڵمانه‌کان وایان ده‌زانی که‌ پێغه‌مبه‌ره‌کان به‌وه‌ زیاتر ڕێزدار ده‌بن. هه‌ندێکیان ده‌یان وت: گوێ بگره‌ هه‌رگیز گوێت لێ نه‌بێ. ئه‌وه‌ وه‌ك ئه‌وه‌یه‌ که‌ له‌ سووره‌تی نیسائدا هاتووه‌. خوای گه‌وره‌ ڕێگری کرد له‌ خاوه‌نباوه‌ڕان که‌ نه‌ڵێن: ﴿رَٰعِنَا﴾[6]. عه‌بدوڕه‌حمانی کوڕی زه‌یدی کوڕی ئه‌سله‌میش هه‌ر وای وتووه‌[7].

---

[1] أبو داود /٣/٣١٤/حه سه نه.

[2] الطبری /٢/٤٦١.

[3] ابن ابی حاتم /١/٣١٧.

[4] ابن ابی حاتم /١/٣١٨.

[5] ابن ابی حاتم /٣١٨.

[6] الطبری /٢/٤٦٢.

[7] ابن ابی حاتم /٣/٩٦٥.

**خوانەناسان و ئەهلی کتێب زۆر دژایەتی موسوڵمانان دەکەن**

خودای گەورە ئەفەرموێت: ﴿مَّا يَوَدُّ ٱلَّذِينَ كَفَرُواْ مِنْ أَهْلِ ٱلْكِتَٰبِ وَلَا ٱلْمُشْرِكِينَ أَن يُنَزَّلَ عَلَيْكُم مِّنْ خَيْرٍ مِّن رَّبِّكُمْ﴾ ئەوانەی خوانەناسن لە ئەهلی کتێب و ئەوانەی شەریك بۆ خودا دادەنێن حەز ناکەن هیچ شتێکی چاکتان لە پەروەردگارتانەوە بۆ بێ. خودای گەورە باسی ئەو دوژمنایەتیە زۆر و توندەی خوانەناسانی ئەهلی کتێب و بتپەرستان دەکاو خاوەنباوەڕانی لێ ئاگادار دەکاتەوەو دەیان ترسێنێ لەوەی کە وەك خاوەنباوەڕان سەیریان بکەن بۆ ئەوەی گشت پەیوەندیەکی خۆشەویستی بپچڕێ لە نێوان خۆیان و ئەواندا، وە خودای گەورەش ئەو چاکەیە دەخاتەوە بەر چاوی خاوەنباوەڕان کە بریتیە لەو پەیامە تێرو تەواوە کە داویەتی بە پێغەمبەرەکەیان موحەمەد و(ﷺ) ئەفەرموێت: ﴿وَٱللَّهُ يَخْتَصُّ بِرَحْمَتِهِۦ مَن يَشَآءُ ۚ وَٱللَّهُ ذُو ٱلْفَضْلِ ٱلْعَظِيمِ﴾ خوداش بە ویستی خۆیەتی کە هەرکەسێ خۆی حەز بکا بە تایبەتی چاکەی لەگەڵ دەکا. خودا خاوەنی چاکە و بەزەی هەرە زۆر و زەبەندەیە.

﴿مَا نَنسَخْ مِنْ ءَايَةٍ أَوْ نُنسِهَا نَأْتِ بِخَيْرٍ مِّنْهَآ أَوْ مِثْلِهَآ ۗ أَلَمْ تَعْلَمْ أَنَّ ٱللَّهَ عَلَىٰ كُلِّ شَىْءٍ قَدِيرٌ ﴿١٠٦﴾ أَلَمْ تَعْلَمْ أَنَّ ٱللَّهَ لَهُۥ مُلْكُ ٱلسَّمَٰوَٰتِ وَٱلْأَرْضِ ۗ وَمَا لَكُم مِّن دُونِ ٱللَّهِ مِن وَلِىٍّ وَلَا نَصِيرٍ ﴿١٠٧﴾﴾

**لە کار خستن و (النسخ) پێناسەی**

خودای گەورە ئەفەرموێت: ﴿مَا نَنسَخْ مِنْ ءَايَةٍ أَوْ نُنسِهَا نَأْتِ بِخَيْرٍ مِّنْهَآ أَوْ مِثْلِهَآ﴾ هەر ئایەتێ لە کار بخەین یان لە بیری بەرینەوە، ئایەتێکی لەو باشتر یان هەر وەك ئەوی ئەخەینە جێ. ئیبنو ئەبی تەلحە لە ئیبنو عەباسەوە ڕەزای خوای لێبێ ئەڵێت: ﴿مَا نَنسَخْ مِنْ ءَايَةٍ﴾ هەر ئایەتێ لە کار بخەین. واتە هەر ئایەتێ بگۆڕین[1]. ئیبنو جورەیج ئەڵێت: لەموجاهیدەوە: ﴿مَا نَنسَخْ مِنْ ءَايَةٍ﴾ واتە: هەر ئایەتێ بسڕینەوە[2]. وە ئیبنو ئەبی نەجیح وتی لە موجاهیدەوە: ﴿مَا نَنسَخْ مِنْ ءَايَةٍ﴾ ئەڵێت: یانی: نوسینەکەی بهێڵنەوە و حوکمەکەی بگۆڕن. ئەم قسەیەی لە هاوەڵەکانی عەبدوڵلای کوڕی مەسعودەوە هێناوە ڕەزای خوایان لێبێ[3]. ئیبنو ئەبی حاتەم ئەڵێت: هەر بەم جۆرە ڕیوایەت کراوە لە ئەبو لعالیە و

---

[1] الطبری /٢/٤٧٣ ص٨٦.

[2] ابن ابی حاتم /١/٣٢١.

[3] ابن ابی حاتم /١/٣٢٢ ص٨٧.

موحەمەدی کوڕی کەعبی قورەیزیەوە[1]. سوددی ئەڵێت: ﴿مَا نَنسَخْ مِنْ ءَايَةٍ﴾ یانی: وەری گرنەوە[2]. ئیبنو ئەبی حاتەم ئەڵێت: یانی وەرگرتنەوەو هەڵگرتنەوە، وەك خودای گەورە فەرمویەتی: (الشيخ والشيخة إذا زنيا فارجموهما البتة). وە ئەفەرموێت: (لو كان لابن ادم واديان من ذهب لابتغى لهماثالثا) واتە: ئەگەر نەوەی ئادەم دوو شیو لە زێڕی هەبێ بەتەمای شیوی سێهەمیشە[3]. ئیبنو جەریر ئەڵێت: ﴿مَا نَنسَخْ مِنْ ءَايَةٍ﴾ هەر ئایەتێك لەكار بخەن، یانی: حوكمی هەر ئایەتێك بگوێزینەوە بۆ ئایەتێكی تر یان بیگۆڕین، وە بیگوازینەوە لە حەرام بۆ حەلاڵ و لە حەلاڵەوە بۆ حەرام،لە شیاوەوە بۆ شیاو یان بە پێچەوانەوە، ئەمەیش هەرگیز نابێ مەگین لە فەرمان دان و قەدەغەكردن و ڕێگە دان و ڕێگە نەدان و هێشتن و نەهێشتنا نەبێ. بەلاَم لە بارەی هەواڵەوە، لەكار خەرو لە كار خراوی تێدا نیە بنچینەی لە كارخستن لە (من نسخ الكتاب) ئەویش گواستنەوەیەتی بۆ ڕونوسێكی تر جگە لە خۆی. دیسان مانای لەكار خستنی بۆ غەیرەز لە خۆی. ئەویش گواستنەوەی دەقێكە بۆ غەیرەز خۆی. ئیتر با لەكار خستنێ حوكمەكە بێ یان نوسینەكەی، ئەوكاتە هەردوو حاڵەتەكەیان لەكار خراوە[4]. خودای گەورە ئەفەرموێت: ﴿أَوْ نُنسِهَا﴾یان لە بیری ببەنەوە. بە دوو شێوە خوێنراوەتەوە (ننساها) و (ننسها)، بەلاَم ئەوەی بە فەتحی نون و هەمزەی دوای سینەكە خوێندویەتیەوە یانی: دوای دەخەین. عەلی كوڕی ئەبو تەلحە ئەڵێت: لە ئیبنو عەباسەوە: ﴿مَا نَنسَخْ مِنْ ءَايَةٍ أَوْ نُنسِهَا﴾ هەر ئایەتێك لەكار بخەین یان لە بیری ببەینەوە. یانی: هەر ئایەتێ بگۆڕین یان وازی لێبێنین نایگۆڕینەوە[5]. موجاهید ئەڵێت: لە هاوەڵەكانی ئیبنو مەسعودەوە: ﴿أَوْ نُنسِهَا﴾ نوسینەكەی جێگیر دەكەین و حوكمەكەی دەگۆڕین[6]. عوبەیدی كوڕی عومەیرو موجاهید و عەتا ئەڵێن: دوای دەخەین و دەیهێڵینەوە[7]. عەتیەی عەوفی ئەڵێت: ﴿أَوْ نُنسِهَا﴾ دوای دەخەین و لەكاری ناخەین[8]. سوددی و ڕەبیعی كوڕی ئەنەسیش هەر وایان

---

[1] ابن ابی حاتم /١/٣٢٢.

[2] ابن ابی حاتم /١/٣٢٢.

[3] ابن ابی حاتم /١/٣٢٤ ص٨٧.

[4] الطبری /١/٤٧٢.

[5] الطبری /٢/٤٧٦.

[6] الطبری /٢/٢٧٣.

[7] الطبری /٢/٤٧٧.

[8] البری /٢/٤٧٧.

وتووە[1]. بەلاّم لەسەر خوێندنەوەی﴿أَوْ نُنسِهَا ﴾ عەبدوڕەزاق ئەڵێت: لە عومەرەوە لە قەتادەوە لەم ئایەتەدا: ﴿مَا نَنسَخْ مِنْ ءَايَةٍ أَوْ نُنسِهَا ﴾ هەر ئایەتێك لە کاری بخەین یان لە بیری ببەینەوە، وتی: خودای مەزن هەرچی ویستی لێبوایە لە بیری پێغەمبەری(ﷺ) دەبردەوە، هەرچیش مەیلی لێبوایە لە کاری دەخست. وە خوای مەزن ئەفەرموێت: ﴿نَأْتِ بِخَيْرٍ مِّنْهَا أَوْ مِثْلِهَا ﴾ ئایەتێکی لەو باشتر یان هەر وەك ئەوی دەخەینە جێ. واتە: لەو حوکمەدا بە پێی بەرژەوەندی ئەوانەی کە پێیان ئەسپێرێت، وەك عەلی کوڕی ئەبو تەلحە لە ئیبنو عەباسەوە: ﴿نَأْتِ بِخَيْرٍ مِّنْهَآ﴾ ئایەتێکی لەو باشتر ئەخەینە جێی. وتی: بۆ ئێوە چاکتر و بەسود ترو شیاوترە[2]. ئەبو عالیە ئەڵێت: ﴿مَا نَنسَخْ مِنْ ءَايَةٍ﴾ واتە: هەر ئایەتێ کاری پێنەکەین یان لە بیری ببەینەوەو دوای بخەین لەلای خۆمان. دەیهێنینەوە یان وەك ئەوەی دەخەینە جێ[3]. سوددی ئەڵێت: ﴿نَأْتِ بِخَيْرٍ مِّنْهَآ أَوْ مِثْلِهَآ ﴾ یانی: ئایەتێکی لەو باشتر یان هەر وەك ئەوەی دەخەینە جێ کە لە کارمان خستوەو وازمان لێ هێناوە[4]. قەتادە ئەڵێت: ﴿نَأْتِ بِخَيْرٍ مِّنْهَآ أَوْ مِثْلِهَآ ﴾ ئایەتێکی لەو باشتر یان هەر وەك ئەوەی دەخەینە جێ، واتە: ئایەتێ دێنین کە دەرفەت و ئاسانکاری و فەرمان و قەدەغەی تێدایە[5].

**باسی ڕاستی لە کارخستن و وەلاّم دانەوەی جوولەکە کە دەیان وت لە کار خستن نیە**

خودای مەزن ئەفەرموێت: ﴿أَلَمْ تَعْلَمْ أَنَّ ٱللَّهَ عَلَىٰ كُلِّ شَىْءٍ قَدِيرٌ ﴿١٠٦﴾ أَلَمْ تَعْلَمْ أَنَّ ٱللَّهَ لَهُۥ مُلْكُ ٱلسَّمَـٰوَٰتِ وَٱلْأَرْضِ ۗ وَمَا لَكُم مِّن دُونِ ٱللَّهِ مِن وَلِىٍّ وَلَا نَصِيرٍ ﴾ مەگەر نەتزانیوە خودا هەموو کارێکی پێدەکرێ؟ نەتزانیوە ئەم ئەرز و ئاسمانە هەر مولکی خودان، جگە خودایش دۆست و یارمەتی دەرێکتان نیە. خودای گەورە ڕێنمای عەبدەکانی دەکا کە هەر خۆی خاوەن دەسەلاّتە بەسەر دروستکراوەکانیا بوون و نەبوونیان بە ویستی خۆیەتی، فەرمانیش بەدەست خۆیەتی، هەرچۆنی ویستووە دروستی کردوون، مەیلی لەهەر کەسێ بێ بەختەوەری دەکاو مەیلیشی لێبێ بەدبەختی دەکا. بە ویستی خۆی کەسێ لەش ساغ دەکا و کەسێ نەخۆش دەخا و یەکێ سەرکەوتوو دەکا و

---

[1] ابن ابی حاتم/۱/۳۲۶.
[2] الطبری /۲/۴۸۱.
[3] ابن ابی حاتم /۱/۳۲۶.
[4] ابن ابی حاتم /۱/۳۲۷.
[5] ابن ابی حاتم /۱/۳۲۷.

یەکێکی تر سەر شۆڕو ڕسوادەکا. هەر بەو شێوەیە فەرمان ڕەوایی دەکا لە نێوان عەبدەکانیدا بە ویستی خۆی. بە مەیلی خۆی هەر شێ حەلاڵ دەکا یان حەرامی دەکا یان ڕێی پێ ئەدا یان پێی نادات، هەر خۆیەتی ویستی لەهەر فەرمانێ ببێ بڕیاری لەسەر ئەدات، کەس ناتوانێ دەست لە کاری بدا. هەرچی دەکا پرسیاری لێناکرێ، بەڵکو ئەوان پرسیاریان لێدەکرێ. بەندەکانی تاقی دەکاتەوە تا چەند گوێڕایەڵی پێغەمبەرەکەیانن لەکارخستندا فەرمان بە شتێ دەکا کە خۆی دەزانێ بەرژەوەندی تێدایە، قەدەغەی شتێکیش دەکا کە خۆی دەزانێ بەرژەوەندی تێدایە، گوێڕایەڵی تەواو بە فەرمانەکانی بڕیارەکانی ئەوەو وازهێنانە لەو شتانە کە ئەو ڕێگری لێکردووە. ئالێرەدا وەڵام دانەوەیەکی زۆر گەورەیە و خوا نەناسی جوولەکەو ئەو بوختانەیان بەتەواوی ئاشکرا دەکا، بەر نەفرینی خودا کەون. کە دەڵێن لەکار خستن نیە و عەقڵ نای سەلمێنێ وەك هەندێکیان وایان وتووە بە نەفامی و خوانەناسی. یان بەدەما و دەم وەك هەندێکیان بە گۆترە کاری وتویانە و درۆو بوختان دەکەن. ئیمام ئەبو جەعفەری کوڕی جەریر ڕەحمەتی خوای لێبێ ئەڵێت: تەفسیری ئەم ئایەتە: مەگەر ئەی موحەمەد(ﷺ)! نەتزانیوە ئەم ئەرز و ئاسمانە هەر موڵکی خودان و دەسەڵاتیش هەر هی منەو هیچ کەسێ خاوەنی دەسەڵات نیە جگە لە من، فەرمان ڕەوایش دەکەم لە ئەرز و ئاسمانەکان بە ویستی خۆم. هەرچیم بوێ دەیکەم و هەرچیم نەوێ ناکرێ و بەویستی خۆم حوکمەکانم دەگۆڕم و لە کاری دەخەم دەربارەی عەبدەکانم چۆنم بوێ و هەرکاتێ بمەوێ بڕیاریان لەسەر ئەدەم بە ویستی خۆم. پاشان وتی: ئەگەر ئەم هەواڵە ڕوی وتار بێ لە خوداوە بۆ پێغەمبەرەکەی(ﷺ) دەربارەی تواناو دەسەڵاتی خۆی، بەدرۆ خستنەوەی جوولەکەشە لەلایەن خودای گەورەوە، کە حاشایان کرد لە نەسخ کردنەوەی حوکمی تەورات و بڕواشیان نەهێنا بە پێغەمبەرێتی عیسا و موحەمەدیش سەلامی خوایان لێبێ کە ڕەوانە کرابوون بەو پەیامەوە لەلایەن خوداوە، بە گۆڕینی حوکمی تەورات کە خودا بڕیاری گۆڕانی داوەئاگاداریشی کردوون کە خودا خاوەنی ئاسمانەکان و زەمینە و دەسەڵاتیش هەر هی ئەوە لە ئاسمانەکان و زەمیندا، گشت بوونەوەر موڵکی ئەوەو لە ژێر فەرمانی ئەودایە، دەبێ گوێڕایەڵ و ملکەچی فەرمانی ئەو بن لەوەی کە فەرمان ئەدا بیکەن یان مەیکەن. هەر ئەو بۆی هەیە هەر بڕیارێ بدا بەسەریاندا بیکەن و هەچیش قەدەغە بکا نەیکەن. مەیلی خۆیەتی هەرچی لەکار بخات و هەرچیش بخاتە کار لە بڕیارو فەرمان و قەدەغەکراوەکانیدا[1]. منیش دەڵێم: ئەوەی پاڵ بە جوولەکەوە دەنێ کە باس لە مەسئەلەی نەسخ بکا، هەر بێدینی و لاساریە، چونکە هیچ بەڵگەیەکی عەقلی نیە ببێتە ڕێگر لەسەر گۆڕینی فەرمانەکانی خودا، خودا خۆی بە ویستی خۆی بڕیار ئەدا و هەچی بوێ دەیکا، لەگەڵ

---

[1] الطبري /٢/٤٨٨ ص٨٨.

ئەوەیشا ئەم نەسخە ڕووی داوە لە کتێبە پێشوکانیدا لە پەیامەکانی ڕابردوودا، وەك ڕێگەی دا بە ئادەم کچەکانی مارە بکا لە کوڕەکانی. پاشان ئەوەی حەرام کرد. وە ڕێگەی دا بە نووح سەلامی خوای لێبێ دوای دەرچوونی لە کەشتیەکە لە هەموو گیانەوەرێك بخوات، پاشان نەسخی هەندێکی کردەوە. مارە برینی دوو خوشك ڕێگەی پێدرا بۆ یەعقوب و نەوەکانی، کەچی ئەوەی قەدەغەکرد لە تەورات و دوای ئەویشا. وە فەرمانی دا بە ئیبراهیم کە کوڕەکەی خۆی سەربڕێت سەلامی خوایان لێبێ پاشان پێش ئەوە سەری ببڕێ نەسخی کردەوە، وە فەرمانی بە زۆرینەی نەوەی ئیسرائیل دا بە کوشتنی ئەوانەی کە گوێرەکەکەیان پەرست لەناویاندا. پاشان ئەو کوشتنەی لەناودا هەلگرتن، تا بەو هۆیەوە هەموو لەناو نەچن. زۆر شتی تریش درێژە دەکێشێ ئەگەر باس بکرێت کە جوولەکە خۆیان دانی پێدا دەنێن و خۆیانی لێ لائەدەن، ئەوەی وەلامی ئەدرێتەوە بەدەم لەم بەلگانە لە بەلگەکان لە مانایدا ناگۆڕێ، بەلکو مەبەستەکە هەر ئەوەیە. وەك لە کتێبە ناودارەکانیاندا مژدە بە موحەمەد(ﷺ) دراوەو فەرمانیش دراوە بە شوێن کەوتنی دەبێ لە فەرمانی لانەدەن، هیچ کرداری وەرناگیرێ لەسەر پەیامەکەی ئەو نەبێ. وتراوە: پەیامە پێشوەکان ماوەکەیان تا ڕەوانە کردنی پێغەمبەرە(ﷺ) ئەمە پێی ناوترێ نەسخ،وەك خودای گەورە ئەفەرموێت: ﴿ثُمَّ أَتِمُّوا۟ ٱلصِّيَامَ إِلَى ٱلَّيْلِ﴾[1] پاشان ڕۆژوتان تەواو کەن تا شەو. وتراویشە: ئەوە ڕەهایە شەریعەتی مەحەمەد(ﷺ) نەسخی کردۆتەوە بە هەموو مانایەك، شوێن کەوتنی پێویست و دیاری کراوە، چونکە بە کتێبێکەوە هاتووە دواین کتێبە لەلایەن خوداوە هاتووە. ئالێرەدا خودای مەزن نەسخی ڕوون کردۆتەوە و ڕێی پێداوە و وەلامی جوولەکەشی پێداوەتەوە بەرنەفرینی خوا کەون و ئەفەرموێت: ﴿أَلَمْ تَعْلَمْ أَنَّ ٱللَّهَ عَلَىٰ كُلِّ شَىْءٍ قَدِيرٌ ﴿١٠٦﴾ أَلَمْ تَعْلَمْ أَنَّ ٱللَّهَ لَهُۥ مُلْكُ ٱلسَّمَـٰوَٰتِ وَٱلْأَرْضِ﴾ مەگەر نەتزانیوە خودا هەموو کارێکی پێدەکرێ؟ نەتزانیوە کە ئەم ئەرز و ئاسمانە هەر مولکی خودان، وەك چۆن خودا خاوەن مولکە و بێبەرامبەر. هەر وایش فەرمان بە مەیلی خۆیەتی: ﴿أَلَا لَهُ ٱلْخَلْقُ وَٱلْأَمْرُ﴾[2] وەدی هێنان و فەرماندان هەر بۆ ئەوە. وە لە سەرەتای سورەتی ال عیمراندا هاتووە کە ڕووی وتاری کردۆتە ئەهلی کتێب و باسی ڕودانی نەسخی کردو و لەلای جوولەکە و ئەفەرموێت: ﴿كُلُّ ٱلطَّعَامِ كَانَ حِلًّا لِّبَنِىٓ إِسْرَٰٓءِيلَ إِلَّا مَا حَرَّمَ إِسْرَٰٓءِيلُ عَلَىٰ نَفْسِهِۦ﴾[3] هەموو جۆرە خواردەمەنیەك بۆ نەوەی ئیسرائیل ڕەوا کراوە، مەگین ئەوەی کە ئیسرائیل خۆی پارێزی

---

[1] البقرة ١٨٧.

[2] الاعراف ٥٤.

[3] ال عمران ٩٣.

لێ کردبێ. وەك بەو زوانە تەفسیر دەکرێت. هەموو مسوڵمانان یەك دەنگن لەسەر دروستی نەسخ لە ئەحکامەکانی خودای مەزنداو هەموو دەڵێن ڕووی داوە. فەرمانی خودایش لەو لەکار خستنەدا پڕە لە کار زانی.

﴿ أَمْ تُرِيدُونَ أَن تَسْـَٔلُوا۟ رَسُولَكُمْ كَمَا سُئِلَ مُوسَىٰ مِن قَبْلُ ۗ وَمَن يَتَبَدَّلِ ٱلْكُفْرَ بِٱلْإِيمَـٰنِ فَقَدْ ضَلَّ سَوَآءَ ٱلسَّبِيلِ ﴿١٠٨﴾ ﴾

## ڕێگری لە پرسیار زۆر کردن

خودای گەورە ئەفەرموێت: ﴿ أَمْ تُرِيدُونَ أَن تَسْـَٔلُوا۟ رَسُولَكُمْ كَمَا سُئِلَ مُوسَىٰ مِن قَبْلُ ۗ وَمَن يَتَبَدَّلِ ٱلْكُفْرَ بِٱلْإِيمَـٰنِ فَقَدْ ضَلَّ سَوَآءَ ٱلسَّبِيلِ ﴾ ئایا ئێوە دەتان هەوێ لە پێغەمبەرتان بپرسن، وەك پێشوو پرسیار لە مووسا کرابوو؟ هەرکەسێ بێباوەڕی بە باوەڕ بگۆڕێتەوە، بەبێ گومان ڕێگەی ڕاستی لێ ون بووە. خودای گەورە لەم ئایەتە پیرۆزەدا ڕێگری لە پرسیاری زۆر لێکردن کردووە لە پێغەمبەر(ﷺ) لەو شتانە کە هێشتان نەبووە و ڕوی نەداوە، وەك ئەفەرموێت: ﴿ يَـٰٓأَيُّهَا ٱلَّذِينَ ءَامَنُوا۟ لَا تَسْـَٔلُوا۟ عَنْ أَشْيَآءَ إِن تُبْدَ لَكُمْ تَسُؤْكُمْ وَإِن تَسْـَٔلُوا۟ عَنْهَا حِينَ يُنَزَّلُ ٱلْقُرْءَانُ تُبْدَ لَكُمْ ﴾[1] ئەی کۆمەڵی خاوەنباوەڕان! لەو شتانە پرسیار مەکەن، گەر بۆتان ڕوون کەنەوە پێی توشی دلگرانی ئەبن، ئەگەر پرسەکەتان هەڵگرن بۆ ئەو کاتەی کە قورئان دێتە خوارەوە، وەڵامەکەتان ئەدرێتەوە. واتە: دوای ئەوە کە قورئان هاتە خوارەوە پرسیار دەربارەی بکەن بۆتان ڕوون دەکاتەوە. پرسیار لە شتێ مەکەن کە ڕوی نەداوە، لەوانەیە بەهۆی ئەو پرسیارەوە شتێکتان لێ قەدەغە بکرێ. هەر بۆیە لە فەرمودەی سەحیحدا هاتووە: بەڕاستی گەورەترین تاوانی مسوڵمانان تاوانی کەسێکە پرسیاری لە شتێ کردبێ حەرام نەکرابێ، بەهۆی پرسیارەکەی ئەوەوە حەرام کرابێ. کاتێ کە پرسیار کرا لە پێغەمبەر (ﷺ) لە دەربارەی پیاوێکەوە، لەناو جێگەدا پیاوێکیتر لەگەڵ ژنەکەیدا ببینێ، ئەگەر قسەبکا، دەربارەی کارێکی گەورە قسەی کردووە، ئەگەر بێ دەنگیش بوو بێدەنگ بووە لەسەر ئەو شێوەیە. پێغەمبەری خودا ئەم جۆرە پرسیارانەی پێناخۆش بووەو بەلایەوە خراپ بووە. پاشان خودای گەورە حوکمی مولاعەنەی ناردە خوارەوە، هەر بۆیە لەهەردوو سەحیحەکەدا لە فەرمودەکەی مەغەیرەی کوڕی شوعبەوە: کە پێغەمبەری خودا (ﷺ) قەدەغەی وتراوە و دەڵێن و بە فیڕۆدانی سامان و زۆر پرسیارکردنی کردووە[2]. وە لە سەحیحی موسلیما هاتووە: وازم لێبێنن لەوەی وازم لێهێناون، چونکە

---

[1] المائدة ١٠١.

[2] فتح الباری /٣/٣٩٨/، مسلم/٣/١٣٤١ ص٨٨.

گەلانی پێش ئێوەلەناوچوون بەهۆی زۆرپرسیاکردنیان و جیاوازیان دەربارەی پێغەمبەرانیان، جا ئەگەر فەرمانم پێکردن بە شتێك ئەوەندەی دەتوانن جێبەجێی بکەن. وە ئەگەر قەدەغەی هەر شتێکم لێکردن لێی دوور کەونەوە، ئەمەی کاتێ فەرموو دوای ئەوە کە ئاگاداری کردن کە خودا حەجی لەسەر نوسیوون، پیاوێ وتی: هەموو ساڵێك ئەی پێغەمبەری خودا(ﷺ)؟ پێغەمبەر(ﷺ) بێدەنگ بوو تا پیاوەکە سێ جار وتیەوە. پاشان پێغەمبەر(ﷺ) فەرمووی: نەخێر: ئەگەر بم وتایە بەڵێ،فەرز دەبوو لەسەرتان،ئەگەر فەرزیش ببوایە لەسەرتان، نەتان دەتوانی ئەنجامە بدەن، پاشان فەرموی: وازم لێبێنن لەوەی وازم لێهێناون[1]. هەربۆیە ئەنەس کوڕی مالیك ئەڵێت: ڕێگریمان لێکرا کە پرسیار بکەین لە پێغەمبەری خودا(ﷺ)لەهەر شتێ، زۆر سەرنجی ڕادەکێشان کە پیاوێکی دەشتەکی داهات و پرسیاری لێدەکرد و ئێمەش گوێمان لێدەگرتن[2]. خودای گەورە ئەفەرموێت: ﴿ أَمْ تُرِيدُونَ أَن تَسْـَٔلُوا۟ رَسُولَكُمْ كَمَا سُئِلَ مُوسَىٰ مِن قَبْلُ ﴾ ئایا ئێوە دەتان هەوێ لە پێغەمبەرتان بپرسن وەك پێشوو لە موسا پرسیار کرابوو؟ ئەمە بۆ پرسی مل نەدانە (إستفهام إنكاري)یە خاوەنباوەڕ و خوانەناسیش دەگرێتەوە چونکە پێغەمبەر(ﷺ) ڕەوانە کراوە بۆ هەموو. وەك خودای گەورە ئەفەرموێت: ﴿ يَسْـَٔلُكَ أَهْلُ ٱلْكِتَـٰبِ أَن تُنَزِّلَ عَلَيْهِمْ كِتَـٰبًا مِّنَ ٱلسَّمَآءِ ۚ فَقَدْ سَأَلُوا۟ مُوسَىٰٓ أَكْبَرَ مِن ذَٰلِكَ فَقَالُوٓا۟ أَرِنَا ٱللَّهَ جَهْرَةً فَأَخَذَتْهُمُ ٱلصَّـٰعِقَةُ بِظُلْمِهِمْ ﴾[3] ئەوانەی ئەهلی کتێب لێت دەپرسن کتێبێکیان بەتایبەتی لەئاسمانەوە بۆ بێنی هەر ئەوانە ئەوەیان لە موسا دەویست، زۆر لەم کارەش گرینگتر بوو، وتیان: خودامان بە ئاشکرا پێنیشان بدە، لە سزای ئەم بەدفەڕیەدا بەر هەورە تریشقە کەوتن. موحەمەدی کوڕی ئیسحاق ئەڵێت: موحەمەدی کوڕی ئەبو موحەمەد بۆی گێڕامەوە لە عیکرەمەوە یان لە سەعیدی کوڕی جوبەیرە،لە ئیبنو عەباسەوە ئەڵێت: ئەی موحەمەد(ﷺ)! کتێبێکمان بۆ بێنە،لە ئاسمانەوە بێتە خوارەوە بۆمان بیخوێنینەوە،چەند ڕوبارێکامن بۆ هەڵقوڵێنە شوێنت دەکەوین و بڕوات پێدەکەین، لەسەر قسەی ئەوانە خودای مەزن ئەم ئایەتەی ناردە خوارەوە: ﴿ أَمْ تُرِيدُونَ أَن تَسْـَٔلُوا۟ رَسُولَكُمْ كَمَا سُئِلَ مُوسَىٰ مِن قَبْلُ ۗ وَمَن يَتَبَدَّلِ ٱلْكُفْرَ بِٱلْإِيمَـٰنِ فَقَدْ ضَلَّ سَوَآءَ ٱلسَّبِيلِ ﴾ ئایا ئێوە دەتان هەوێ لەپێغەمبەرتان بپرسن وەك پێشوو لە موسا پرسیا کرابوو؟ هەرکەسێ خوانەناسی بە باوەڕ بگۆڕێتەوە، بەبێ گومان

---

[1] مسلم/٢/٩٧٥.

[2] مسلم /١/٤١ ص٨٩.

[3] النساء ١٥٣. الدارمی/١/٤٨/، المجمع/١/١٥٨ ص٨٩.

ڕێگەی ڕستی لێ وون بووە[1]. مەبەست لێرەدا ئەوەیە،خودای گەورە زەمی ئەو کەسانە دەکا کە پرسیار لە پێغەمبەر(ﷺ) دەکەن لەهەر شتێ کە ئازار بگەیەنێ و چەواشە کاری تێدا بێت. وەك چۆن ئەوەی ئیسرائیل پرسیاریان لە مووسا دەکرد سەلامی خوای لێبێ لەبەر لاساری و ئازاردانی و بڕوا پێنەکردنی. خودای مەزن ئەفەرموێت: ﴿وَمَن يَتَبَدَّلِ ٱلْكُفْرَ﴾ هەرکەسێ خوانەناسی بە باوەڕ بگۆڕێتەوە، بێگومان ڕێگەی ڕاستی لێ وون بووەو ڕێگەی نەفامی و گومڕایی گرتوەتە بەر وە هەر بەو جۆرەش بڕوای بە پێغەمبەران نەبێ و شوێنیان نەکەوێ و ملکەچی فەرمانیان نەبێ و دژایەتیان بکا و بە درۆیان بخاتەوە، هەوڵ بدا پرسیاریان لێبکا بە شتێ کە پێویستان پێی نیە هەر بۆ ئازاردان و لاساری لەبەر خوانەناسی ئەو پرسیارانە بکات، ئەوە ڕێگەی ڕاستی لێ وون بووە. وەك خودای مەزن ئەفەرموێت: ﴿أَلَمْ تَرَ إِلَى ٱلَّذِينَ بَدَّلُوا۟ نِعْمَتَ ٱللَّهِ كُفْرًا وَأَحَلُّوا۟ قَوْمَهُمْ دَارَ ٱلْبَوَارِ ﴿٢٨﴾ جَهَنَّمَ يَصْلَوْنَهَا ۖ وَبِئْسَ ٱلْقَرَارُ﴾[2] ئایا نەتدی ئەو کەسانەی ناشکوریان لەبەرانبەر چاکەی خوادا کردووەو گەلی خۆیان بەرە و هەڵدێری زۆر نارەحەت برد. لە جەهەنەمدا هەڵدەچۆقێنن پیسترین شوێنیان هەیە؟ ئەبولعالیە ئەڵێت: گوڕوتین دەگۆڕنەوە بە خۆشگوزەرانی[3].

﴿ وَدَّ كَثِيرٌ مِّنْ أَهْلِ ٱلْكِتَٰبِ لَوْ يَرُدُّونَكُم مِّنۢ بَعْدِ إِيمَٰنِكُمْ كُفَّارًا حَسَدًا مِّنْ عِندِ أَنفُسِهِم مِّنۢ بَعْدِ مَا تَبَيَّنَ لَهُمُ ٱلْحَقُّ ۖ فَٱعْفُوا۟ وَٱصْفَحُوا۟ حَتَّىٰ يَأْتِىَ ٱللَّهُ بِأَمْرِهِۦٓ ۗ إِنَّ ٱللَّهَ عَلَىٰ كُلِّ شَىْءٍ قَدِيرٌ ﴿١٠٩﴾ وَأَقِيمُوا۟ ٱلصَّلَوٰةَ وَءَاتُوا۟ ٱلزَّكَوٰةَ ۚ وَمَا تُقَدِّمُوا۟ لِأَنفُسِكُم مِّنْ خَيْرٍ تَجِدُوهُ عِندَ ٱللَّهِ ۗ إِنَّ ٱللَّهَ بِمَا تَعْمَلُونَ بَصِيرٌ ﴿١١٠﴾﴾

## ڕێگری لە گرتنە بەری ڕێگەی ئەهلی کتێب

خودای گەورە ئەفەرموێت: ﴿ وَدَّ كَثِيرٌ مِّنْ أَهْلِ ٱلْكِتَٰبِ لَوْ يَرُدُّونَكُم مِّنۢ بَعْدِ إِيمَٰنِكُمْ كُفَّارًا حَسَدًا مِّنْ عِندِ أَنفُسِهِم مِّنۢ بَعْدِ مَا تَبَيَّنَ لَهُمُ ٱلْحَقُّ ۖ فَٱعْفُوا۟ وَٱصْفَحُوا۟ حَتَّىٰ يَأْتِىَ ٱللَّهُ بِأَمْرِهِۦٓ ۗ إِنَّ ٱللَّهَ عَلَىٰ كُلِّ شَىْءٍ قَدِيرٌ﴾ زۆر کەس لە خاوەن کتێبەکان چونکە ئێرەیتان پێدەبەن حەز دەکەن لە پاش باوەڕ هێنانتان کەلێشیان ئاشکرایە ڕاست کامەیە پەشیمانتان بکەنەوە، ئێوە چاویان لێبپۆشن و لە هەڵەکانیان ببورن،تا فەرمانی خودا دەگا، خودا هەموو کارێکی پێ دەکرێ. خودای گەورە ئەوەندە خاوەنباوەڕەکانی خۆی دەترسێنێ لە گرتنە بەری ڕێگای خوانەناسی ئەهلی کتێب، ئاگادارین دەکا کە

---

[1] الطبری /٢/٤٩٠.

[2] إبراهیم ٢٨-٢٩.

[3] ابن ابی حاتم /١/٣٣٠ ص٨٩.

ئەوانە بە نهێنی و ئاشکرا دژایەتی خاوەنباوەڕان دەکەن، چونکە ئەوانە زۆر ئیرەیی بە خاوەنباوەڕان دەبەن. کە زۆر چاکیش دەزانن کە بەڕێز و چاکن و پێغەمبەرەکەشیان زۆر بەڕێزو چاکە. خودای گەورە فەرمان دەکا بە عەبدە خاوەنباوەڕەکانی کە چاو پۆشی و لێبوردەیان هەبێ و خۆڕاگرین تا خودای گەورە یارمەتی خۆی دەنێرێ و ڕزگاریان دەکا و سەریان دەخات. فەرمانیشیان پێدەکا کە نوێژ بکەن و زەکات بدەن و زۆر هانیان ئەدات لەسەری. ئیبنو ئەبی حاتەم ڕیوایەتی کردووە لە عەبدوللای کوڕی کەعبی کوڕی مالیکەوە، کە کەعبی کوڕی ئەشرەفی جولەکە شاعیر بووە زۆر لە پێغەمبەری دەخوێند(ﷺ) لەسەر ئەو خودا ئەم ئایەتەی ناردە خوارەوە کە ئەفەرموێت: ﴿ وَدَّ كَثِيرٌ مِّنْ أَهْلِ الْكِتَابِ لَوْ يَرُدُّونَكُم ﴾ زۆر کەس لە خاوەن کتێبان حەز دەکەن پەشیمانتان بکەنەوە تا دەگاتە: ﴿فَاعْفُوا وَاصْفَحُوا﴾ ئێوە چاویان لێبپۆشن و لە هەڵەکانیان ببورن[1]. زەحاك لە ئیبنو عەباسەوە ئەڵێت: بێگومان کاتێ کە پێغەمبەرێکی نەخوێندەوار هەواڵیان پێئەدا بەو کتێب و پێغەمبەر و ئەو نیشانانە کە لەلایانە بڕوایشی بەوانە هەیە وەك ئەوان بڕوایان پێی هەیە، بەڵام ئەوانە حاشای لێدەکەن و ملی پێنادەن، چونکە ئەوانە خوانەناس و حەسوود و لاسارن هەر بۆیە خوای گەورە ئەفەرموێت: ﴿كُفَّارًا حَسَدًا مِّنْ عِندِ أَنفُسِهِم مِّن بَعْدِ مَا تَبَيَّنَ لَهُمُ الْحَقُّ ﴾ بتانکەنەوە بە خوانەناس دوای ئەوە کە ڕاستیەکەیان بۆ ڕوون بوەتەوە، هەر ئەو حەسوودیە بوو پاڵی پێوە دەنان بۆ ئەو خوانەناسیە کە سروشتی تایەبەتی خۆیان بووە، خودای گەورەش زۆرلۆمە و سەرزەنشتی کردوون[2]. وە فەرمانیشی داوە بە پێغەمبەرەکەی(ﷺ) و بڕواداران کە بەردەوام بن لەسەر بیروبڕوای خۆیان و بڕوایان پتەو بێ بەوەی کە بۆیان دێتە خوارەوە و ئەوەیشی لە پێشا ڕەوانە کراوە، بۆئەوەی پاداشتی تەواویان باتەوەو یارمەتی دەریان بێ. ڕەبیعی کوڕی ئەنەس ئەڵێت: ﴿مِّنْ عِندِ أَنفُسِهِم ﴾ لەلایەن خۆیانەوە[3]. ئەبو عالیە ئەڵێت: ﴿مِّن بَعْدِ مَا تَبَيَّنَ لَهُمُ الْحَقُّ ﴾ دوای ئەوە ڕاستییان بۆ ڕوون بوەوە. واتە: دوای ئەوە کە بۆیان دەرکەوت کە موحەمەد(ﷺ) پێغەمبەری خودایە. لەلای خۆیان لە تەورات و ئینجیلدا نوسراوە، بڕوایان پێنەکرد لەبەر حەسودی ولاساری و سەرکەشیان، هەر لەبەر ئەوەی لە نەوەی ئیسرائیل نیە و لە غەیرەز خۆیانە[4]. قەتادە و ڕەبیعی کوڕی ئەنەس و سوددیش هەر وایان

---

[1] ابن ابی حاتم /٣٣١/١.

[2] الطبری /٥٠٢/٢ ص٩٠.

[3] ابن ابی حاتم /٣٣٢/١.

[4] ابن ابی حاتم /٣٣٥/١.

وتووە. ئەم ئایەتە کە ئەفەرموێت: ﴿فَٱعۡفُواْ وَٱصۡفَحُواْ حَتَّىٰ يَأۡتِيَ ٱللَّهُ بِأَمۡرِهِۦٓۗ﴾ ئێوە چاویان لێ بپۆشن و لە هەڵەکانیان ببورن تا فەرمانی خودا دەگا. ئەو ئایەتە وایە کە ئەفەرموێت: ﴿وَلَتَسۡمَعُنَّ مِنَ ٱلَّذِينَ أُوتُواْ ٱلۡكِتَٰبَ مِن قَبۡلِكُمۡ وَمِنَ ٱلَّذِينَ أَشۡرَكُوٓاْ أَذٗى كَثِيرٗا﴾[1] لەوانەی ئەهلی کتێب لە پێش خۆتان و لەو کەسانەی شەریك بۆ خودا دادەنێن زۆر قسەی ناخۆش دەبیستن و ئازاری زۆریشتان ئەدەن. عەلی کوڕی ئەبو تەلحە ئەڵێت: لە ئیبنو عەباسەوە لەم دەقەدا کە خودای مەزن ئەفەرموێت: ﴿فَٱعۡفُواْ وَٱصۡفَحُواْ حَتَّىٰ يَأۡتِيَ ٱللَّهُ بِأَمۡرِهِۦٓ﴾ ئێوە چاویان لێبپۆشن و لە هەڵەکانیان ببورن تا فەرمانی خودا دەگا. ئەڵێت: ئەم ئایەتە نەسخی کردوەتەوە کە ئەفەرموێت: ﴿فَٱقۡتُلُواْ ٱلۡمُشۡرِكِينَ حَيۡثُ وَجَدتُّمُوهُمۡ﴾[2] ئەو بتپەرستانەت لە کوێ وەدەست کەوت لە کوشتنیان دەست مەپارێزن. ئەم ئایەتەش: ﴿قَٰتِلُواْ ٱلَّذِينَ لَا يُؤۡمِنُونَ بِٱللَّهِ وَلَا بِٱلۡيَوۡمِ ٱلۡأٓخِرِ﴾[3] لەگەڵ ئەوانەدا بجەنگن کە بڕوایان بە خودا و ڕۆژی قیامەت نیە. تا دەگاتە: ﴿وَهُمۡ صَٰغِرُونَ﴾ لە کاتێکا ئەوان سەر شۆڕو ڕسوان. ئەو لێبوردنەی نەسخ کردەوە لەسەر بتپەرستان[4]. ئەبو عالیە و ڕەبیعی کوڕی ئەنەس و قەتادە و سوددیش هەروایان وتووە[5]. بەئایەتی شمشێر نەسخ بوەتەوە. ئەم ئایەتەش هەر ئیشارەتی پێدەکا کە ئەفەرموێت: ﴿حَتَّىٰ يَأۡتِيَ ٱللَّهُ بِأَمۡرِهِۦٓ﴾ تا فەرمانی خودا دەگا. ئیبنو ئەبی حاتەم ڕیوایەتی کردووە لە ئوسامەی کوڕی زەیدەوەئەڵێت: پێغەمبەری خودا(ﷺ) هاوەڵەکانی چاوپۆشیان لە بتپەرستان و ئەهلی کتێب دەکرد وەك خودای مەزن فەرمانی پێدابوون، خۆیان دەگرت لەسەر ئێش و ئازاریان. خودای مەزن ئەیفەرموو: ﴿فَٱعۡفُواْ وَٱصۡفَحُواْ حَتَّىٰ يَأۡتِيَ ٱللَّهُ بِأَمۡرِهِۦٓۗ إِنَّ ٱللَّهَ عَلَىٰ كُلِّ شَيۡءٖ قَدِيرٞ﴾ ئێوە چاویان لێبپۆشن و لە هەڵەکانیان ببورن، تا فەرمانی خودا دەگا، خودا توانای بەسەر هەموو کارێکا هەیە. پێغەمبەری خودا(ﷺ) کاری بەو فەرمانە دەکرد کە خودا پێی ڕاگەیاندبوو، تائەوکاتە کەخودا ئیزنیدابیان کوژێ. خودای مەزن بە هۆی پێغەمبەرەوە(ﷺ) ئەوەی لەناوی بر لەسەرکردەکانی

---

[1] ال عمران ١٨٦. ابن ابی حاتم /١/٣٣٥.

[2] التوبة ٥.

[3] التوبة ٧.

[4] ابن ابی حاتم /١/٣٣٤.

[5] ابن ابی حاتم /١/٣٣٥.

قورەیش لەناوی بردن[1]. ئەمە سەنەدەکانی ڕاستە. بەڵام لەشەش کتێبەکەدا لە سونەنەکاندا من چاوم پێنەکەوتووە. بەڵام لە هەردوو سەحیحەکەدا ئەصلێکی هەیە لە ئوسامەی کوڕی زەیدەوە[2].

## هەڵنان بۆ ئاکاری چاك

خودای مەزن ئەفەرموێت: ﴿وَأَقِيمُوا۟ ٱلصَّلَوٰةَ وَءَاتُوا۟ ٱلزَّكَوٰةَ ۚ وَمَا تُقَدِّمُوا۟ لِأَنفُسِكُم مِّنْ خَيْرٍ تَجِدُوهُ عِندَ ٱللَّهِ﴾ نوێژ بکەن و زەکات بدەن، هەر چاکەیەك پێش خۆتان بخەن، لای خودا پێتان دەگاتەوە. خودای مەزن بەندەکانی هەڵدەنێ بۆ ئەو شتانەی کە سوودیان پێدەگەیەنێت و ئاکامەکەی لە ڕۆژی قیامەتا بۆ خۆیانە، لە نوێژکردن و زەکات دان. تا خودای گەورە سەرکەوتنیان بۆ وەدەست دێنێ لە ژیانی دنیا و لە ڕۆژی قیامەتیشدا﴿يَوْمَ لَا يَنفَعُ ٱلظَّـٰلِمِينَ مَعْذِرَتُهُمْ ۖ وَلَهُمُ ٱللَّعْنَةُ وَلَهُمْ سُوٓءُ ٱلدَّارِ﴾[3] ڕۆژێ کە ستەم کاران پاکانەیان سودێکیان پێناگەیەنێ، گشتیان بەر نەفرینی خودا کراون ناڵەبار ترینماڵیان هەیە، هەر بۆیە خودای گەورە ئەفەرموێت: ﴿إِنَّ ٱللَّهَ بِمَا تَعْمَلُونَ بَصِيرٌ﴾ هەرچی بکەن خودا دەیزانێ، واتە: خودا بێئاگا نیە لەهەر کارێ و هیچی لێ ون نابێ و نافەوتێ. ئیتر ئەو شتە چاك بێ یان خراپ، بەو زوانە هەرکەسەو بە پێی ئاکاری پاداشت ئەداتەوە.

﴿وَقَالُوا۟ لَن يَدْخُلَ ٱلْجَنَّةَ إِلَّا مَن كَانَ هُودًا أَوْ نَصَـٰرَىٰ ۗ تِلْكَ أَمَانِيُّهُمْ ۗ قُلْ هَاتُوا۟ بُرْهَـٰنَكُمْ إِن كُنتُمْ صَـٰدِقِينَ ﴿١١١﴾ بَلَىٰ مَنْ أَسْلَمَ وَجْهَهُۥ لِلَّهِ وَهُوَ مُحْسِنٌ فَلَهُۥٓ أَجْرُهُۥ عِندَ رَبِّهِۦ وَلَا خَوْفٌ عَلَيْهِمْ وَلَا هُمْ يَحْزَنُونَ ﴿١١٢﴾ وَقَالَتِ ٱلْيَهُودُ لَيْسَتِ ٱلنَّصَـٰرَىٰ عَلَىٰ شَىْءٍ وَقَالَتِ ٱلنَّصَـٰرَىٰ لَيْسَتِ ٱلْيَهُودُ عَلَىٰ شَىْءٍ وَهُمْ يَتْلُونَ ٱلْكِتَـٰبَ ۗ كَذَٰلِكَ قَالَ ٱلَّذِينَ لَا يَعْلَمُونَ مِثْلَ قَوْلِهِمْ ۚ فَٱللَّهُ يَحْكُمُ بَيْنَهُمْ يَوْمَ ٱلْقِيَـٰمَةِ فِيمَا كَانُوا۟ فِيهِ يَخْتَلِفُونَ ﴿١١٣﴾﴾

## ئاواتی ئەهلی کتێب

خودای گەورە ئەفەرموێت: ﴿وَقَالُوا۟ لَن يَدْخُلَ ٱلْجَنَّةَ إِلَّا مَن كَانَ هُودًا أَوْ نَصَـٰرَىٰ ۗ تِلْكَ أَمَانِيُّهُمْ ۗ قُلْ هَاتُوا۟ بُرْهَـٰنَكُمْ إِن كُنتُمْ صَـٰدِقِينَ﴾ وتیان: هەر تەنیا مووسایی یان عیسایی دەچنە بەهەشت، ئەمە ئاواتی خۆیانە، بڵێ: دەسا بەڵگەی خۆتان نیشان دەن، ئەگەر پێتان وایە ڕاست دەکەن. خودای گەورە باسی جوولەکە و گاورەکان دەکا کە چەندە لە خۆبایین بەوەی خۆیان، هەریەکە لەوان دەڵێ: تەنیا ئەو کەسانە دەچنە بەهەشت لەسەر ئاینی ئەوانە، وەك خودای گەورە لە

---

[1] ابن ابی حاتم /١/٣٣٢ ص٩٠.

[2] فتح الباری /٨/٨٧/مسلم/٣/١٤٢٢.

[3] غافر ٥٢.

سوورەتی مائیدە باسیان دەکاو دەفەرمویت: ئەوانە دەلێن: ﴿نَحْنُ أَبْنَٰٓؤُا۟ ٱللَّهِ وَأَحِبَّٰٓؤُهُۥ﴾[1] ئێمە کوڕان و خۆشەویستانی خوداین. خودای گەورە بە درۆیان دەخاتەوەو هەواڵیان پێئەدا کە لەسەر تاوانەکانیان سزایان ئەدات، خۆ ئەگەر بە قسەی ئەوان بوایە توشی سزادان نەدەبوون. وەك لە پێشا وتیان چەند ڕۆژێ نەبێ سزا نادرێن، پاشان دەگوێزرێنەوە بۆ بەهەشت. خودای گەورە لەوێشدا وەلامیان ئەداتەوە لەسەر ئەو قسەی کە کردویانە بەبێ بەلگەو نیشانەیەك کە بیهێنن و ئەفەرموێت: ﴿تِلْكَ أَمَانِيُّهُمْ﴾ ئەمە ئاواتیانە ئەبو لعالیە ئەلێت: ئاواتێکە و دەیخوازن لە خودا بە ناهەقی[2]. قەتادە و ڕەبیعی کوڕی ئەنەسیش هەر وایان وتووە[3]. پاشان خودای گەورە ئەفەرموێت: ﴿قل﴾ ئەی موحەمەد(ﷺ)! بلێ: ﴿هَاتُوا۟ بُرْهَٰنَكُمْ﴾ دەسا بەلگەی خۆتان نیشان دەن. ئەبولعالیە و موجاهید و سوددی و ڕەبیعی کوڕی ئەنەسیش ئەلێن: بەلگەتان بێنن[4]. قەتادە ئەلێت: بەلگەی خۆتان بێنن لەسەر ئەوە﴿إِن كُنتُمْ صَٰدِقِينَ﴾ ئەگەر وادەزانن ڕاست دەکەن لەو قسەتاندا کە دەیلێن[5]. پاشان خودای گەورە ئەفەرموێت: ﴿ بَلَىٰ مَنْ أَسْلَمَ وَجْهَهُۥ لِلَّهِ وَهُوَ مُحْسِنٌ﴾ هەرکەسێ بە دلی پاك هەمیشە ڕوو لە خودا بێ و ئاکار چاك بێ، واتە: هەر کەسێ بە پاکی کار بۆ خودا بکا بە تەنیا کە شەریکی نیە، وەك خودای گەورە ئەفەرموێت: ﴿ فَإِنْ حَآجُّوكَ فَقُلْ أَسْلَمْتُ وَجْهِىَ لِلَّهِ وَمَنِ ٱتَّبَعَنِ ﴾[6] ئەگەر کێشەت لەگەلێ دەکەن، تۆ هەر بلێ: من لەگەلێ شوێن کەوتوانم بە دلی پاك ڕوم کردوەتە خودا. ئەبولعالیە و ڕەبیع ئەلێن: ﴿ بَلَىٰ مَنْ أَسْلَمَ وَجْهَهُۥ لِلَّهِ ﴾ بەلێ! هەرکەسێ بە دلی پاك ڕووی لە خودا بێ[7]. سەعیدی کوڕی جوبەیر ئەلێت: ﴿ بَلَىٰ مَنْ أَسْلَمَ ﴾ بەلێ! هەرکەسێ بە دلی پاك ئاینەکەی ڕاگرێ[8] ﴿وَهُوَ مُحْسِنٌ﴾ ئاکار چاك بێ، واتە: شوێن پێغەمبەر(ﷺ) بکەوێ لە ئاینەکەیدا، چونکە بۆ کارێ کە قبولێ بکرێ دوو مەرج هەیە: یەکەمیان دەبێ بە دلی پاك و تەنیا بۆ خودا بێ، دووەمیش: ڕاست و ڕەواو ڕێکی شەرع بێ، هەرکاتێ

---

[1] المائدة ١٨.

[2] ابن ابی حاتم /١/٣٣٦ ص٩٠.

[3] ابن ابی حاتم /١/٣٣٦.

[4] ابن ابی حاتم /١/٣٣٧.

[5] ابن ابی حاتم /١/٣٣٧.

[6] ال عمران ٢٠.

[7] ابن ابی حاتم /١/ ٣٣٧ ص٩١.

[8] ابن ابی حاتم/١/٣٣٠.

تەنیا بۆ خودا نەبوو، ڕاست و ڕەوایش نەبوو وەرناگیرێ هەر بۆیە پێغەمبەری خودا(ﷺ) فەرمویەتی: هەرکەسێ کارێکی کردبێ و فەرمانی ئێمەی لەسەر نەبوبێ ئەو کارە وەرنەگیراوە[1]، موسلیم ڕیوایەتی کردووە. ئاکاری قەشەکان و ئەوانەی وەك ئەوانن باواش دانرێ لەبەر خودا دڵپاکن، ئەو دڵپاکیانە لێ وەرناگیرێ، تا ئەو کارەیان بە پێی پەیامی پێغەمبەر(ﷺ)نەبێ کە بۆ هەموو خەڵکی و بۆ ئەوان ڕەوانە کراوە. خودای مەزن دەربارەی ئەوان و هاوێنەی ئەوان ئەفەرموێت: ﴿ وَقَدِمْنَآ إِلَىٰ مَا عَمِلُوا۟ مِنْ عَمَلٍ فَجَعَلْنَـٰهُ هَبَآءً مَّنثُورًا ﴾[2] هەرکارێ کردویانە ڕاوی دەنێن، هەر وەك تۆزی بابردەی پێدەکەین. وە ئەفەرموێت: ﴿ وَٱلَّذِينَ كَفَرُوٓا۟ أَعْمَـٰلُهُمْ كَسَرَابٍۭ بِقِيعَةٍ يَحْسَبُهُ ٱلظَّمْـَٔانُ مَآءً حَتَّىٰٓ إِذَا جَآءَهُۥ لَمْ يَجِدْهُ شَيْـًٔا ﴾[3] ئەوانەی خوانەناس بوون کردەوەیان وەك ئەو تراویلکە وایە کە لە بیاباندا هەیە، تینو وادەزانێ ئاوە. وە ئەفەرموێت: ﴿ وُجُوهٌ يَوْمَئِذٍ خَـٰشِعَةٌ ﴿٢﴾ عَامِلَةٌ نَّاصِبَةٌ ﴿٣﴾ تَصْلَىٰ نَارًا حَامِيَةً ﴿٤﴾ تُسْقَىٰ مِنْ عَيْنٍ ءَانِيَةٍ ﴾[4] لەو ڕۆژەدا هەندێ ڕوخسار بزڕکاون و شەرمەزارن، لە کارکردنا چەوساون، گرفتاری ئاگرێکی سوتێنەر دەبن. ئاو دەدرێن لەسەر چاوەی هەرە گەرمەوە. بەڵام ئەگەر کارەکانیان ڕێکی شەرع بوو بە شێوە ئاشکراکەی، کەچی ئەوەی پێی هەڵدەستێ بە دڵپاکی بۆ خودای نەکرد، دیسان ئەوەش هەر وەرناگیرێتەوەو ئەدرێتەوە بەسەر خاوەنەکەیدا، ئەمە حاڵی ڕیاکارو دووڕوانە وەك خودای مەزن ئەفەرموێت: ﴿إِنَّ ٱلْمُنَـٰفِقِينَ يُخَـٰدِعُونَ ٱللَّهَ وَهُوَ خَـٰدِعُهُمْ وَإِذَا قَامُوٓا۟ إِلَى ٱلصَّلَوٰةِ قَامُوا۟ كُسَالَىٰ يُرَآءُونَ ٱلنَّاسَ وَلَا يَذْكُرُونَ ٱللَّهَ إِلَّا قَلِيلًا ﴾[5] بێگومان دووڕوەکان دەیانەوێ خودا فریو دەن، کەچی خودا دەیان خەڵەتێنێ ئەگەر دەچن نوێژ بکەن بەتەوەزلی هەڵدەستن ڕووبینی لە خەڵك دەکەن، کەمێك نەبێ یادی خوداش ناکەن. وە ئەفەرموێت: ﴿فَوَيْلٌ لِّلْمُصَلِّينَ ﴿٤﴾ ٱلَّذِينَ هُمْ عَن صَلَاتِهِمْ سَاهُونَ ﴿٥﴾ ٱلَّذِينَ هُمْ يُرَآءُونَ ﴿٦﴾ وَيَمْنَعُونَ ٱلْمَاعُونَ ﴾[6] هاوار بۆ ئەو نوێژکەرانەی هۆش بە نوێژەکانیان نادەن، ئەوانەی دەستەی ڕوو بینانن، دەبنە ڕێگر لە بەربوودان و هاریکاری خەڵکی لەکاردا. هەربۆیە خودای مەزن ئەفەرموێت:

---

[1] مسلم /٣/١٣٤٤ ص٩١.

[2] الفرقان ٢٣.

[3] النور ٣٩.

[4] الغاشية ٢-٥.

[5] النساء ١٤٢.

[6] الماعون ٤-٧.

﴿فَمَن كَانَ يَرْجُواْ لِقَآءَ رَبِّهِۦ فَلْيَعْمَلْ عَمَلًا صَٰلِحًا وَلَا يُشْرِكْ بِعِبَادَةِ رَبِّهِۦٓ أَحَدًا﴾[1] هەرکەسێ لە ئێوە بۆ دیداری پەروەردگاری بە ئاواتە، با کاری چاك ڕەچاو بکا و جگە لە پەروەردگاری خۆی هیچ کەسێ نەپەرستێ.

وە لەم ئایەتە پیرۆزەشا ئەفەرموێت: ﴿ بَلَىٰ مَنْ أَسْلَمَ وَجْهَهُۥ لِلَّهِ وَهُوَ مُحْسِنٌ﴾ بەلێ ! هەرکەسێ بە دڵی پاك هەمیشە ڕووی لە خودا بێ و ئاکاری چاك بێ ﴿فَلَهُۥٓ أَجْرُهُۥ عِندَ رَبِّهِۦ وَلَا خَوْفٌ عَلَيْهِمْ وَلَا هُمْ يَحْزَنُونَ﴾ پاداشتی خۆی لە پەروەردگاری وەردەگرێ و ئەم کەسانە نە هیچ ترسێکیان دێتە بەرو نەخەم دەخۆن. خوای مەزن پاداشتی خۆی بۆ دابین کردووە و دڵنیاشی کردووە لەو شتانەی ترسی لێی هەیە ﴿فَلَا خَوْفٌ عَلَيْهِمْ﴾ نە هیچ ترسێکیان دێتە سەر ڕێ لەوەی کە ڕوو بەڕوی دەبنەوە و ﴿وَلَا هُمْ يَحْزَنُونَ﴾ نە خەم دەخۆن بۆ ئەوەی کە بە جێیان هێشتووە لە ڕابردوودا. وەك سەعیدی کوڕی جوبەیر ئەڵێت: ﴿فَلَا خَوْفٌ عَلَيْهِمْ﴾ یانی: هیچ ترسێکیان لەسەر نیە لە ڕۆژی قیامەتا ﴿وَلَا هُمْ يَحْزَنُونَ﴾ نە خەم دەخۆن بۆ مردن[2].

## ڕقەبەرایەتی جوولەکە و گاور لە نێوان خۆیاندا لەبەر خوانەناسی و لاساریان

خودای گەورە ئەفەرموێت: ﴿وَقَالَتِ ٱلْيَهُودُ لَيْسَتِ ٱلنَّصَٰرَىٰ عَلَىٰ شَىْءٍ وَقَالَتِ ٱلنَّصَٰرَىٰ لَيْسَتِ ٱلْيَهُودُ عَلَىٰ شَىْءٍ وَهُمْ يَتْلُونَ ٱلْكِتَٰبَ﴾ جووەکان وتیان: فەلەکان لەسەر هیچ نین، فەلەکانیش وتیان: جوولەکەکان لەسەر هیچ نین، کە هەردوو لاش کتێب دەخوێننەوە. خودای گەورە باسی جیاوازی و دژایەتی و ڕق و کینەو بەر هەڵستکاری نێوان گاورو جوولەکە دەکا، وەك موحەمەدی کوڕی ئیسحاق ڕیوایەتی کردووە لە ئیبنو عەباسەوە ئەڵێت: کاتێ کە خەڵکی نەجران لە مەسیحیەکان دەهاتنە خزمەت پێغەمبەری خودا(ﷺ) زاناکانی جوولەکە هاتنە لایان بوە کێشەیان لەلای پێغەمبەری خودا(ﷺ) ڕافعی کوڕی حورەیمەلە وتی: ئێوە لەسەر هیچ شتێك نین بێباوەڕی خۆی دەربڕی دەربارەی عیسا و ئینجیل، پیاوێکی خەڵکی نەجران لە مەسیحیەکان وتی بە جوولەکەکان: ئێوە لەسەر هیچ شتێك نین، حاشای لە پێغەمبەرایەتی مووسا و تەوراتیش کرد. خودای گەورە لەسەر قسەی ئەم دوانە قورئانی ناردە خوارەوە وفەرموی: ﴿وَقَالَتِ ٱلْيَهُودُ لَيْسَتِ ٱلنَّصَٰرَىٰ عَلَىٰ شَىْءٍ وَقَالَتِ ٱلنَّصَٰرَىٰ لَيْسَتِ ٱلْيَهُودُ عَلَىٰ شَىْءٍ وَهُمْ يَتْلُونَ ٱلْكِتَٰبَ﴾ جووەکان وتیان: فەلەکان لەسەر هیچ نین، فەلەکانیش وتیان: جوولەکەکان لەسەر هیچ نین. کەهەردوولاش کتێب دەخوێننەوە. وتی: هەردوولا لە کتێبەکەیدا دەیخوێنێتەوە کە بڕوای

---

[1] الكهف ١١٠.

[2] ابن ابی حاتم /١/٣٣٨ ص٩١.

هەیە بەوەی تر کە حاشای لێ دەکا. واتە: جوولەکە بڕوای نیە بە عیسا کەچی تەوراتیشیان لەلایە. لە تەوراتدا خودای گەورە پەیمانی لێوەرگرتوون لەسەر زمانی مووسا کە دەبێ بڕوایان بە عیسا هەبێ. وە لە ئینجیلا کە عیسا هێناویەتی بڕوای بە مووسا بووە و ئەویش لە تەوراتدا لەلایەن خوداوە هاتووە. هەردوولا حاشایان دەکرد لەوەی لەلای ئەوی ترە لە فەلەو لە جوولەکەکان. پاشان خودای گەورە ئەفەرموێت: ﴿كَذَٰلِكَ قَالَ ٱلَّذِينَ لَا يَعْلَمُونَ مِثْلَ قَوْلِهِمْ﴾ نەزانیش لە بتپەرستەکان هەر ئەوە دەڵێن کە ئەمانە پێیان دەڵێن. خودای گەورە بەم ئایەتە نەفامی فەلە و جوولەکەکان دەردەخا کە هەریەکەیان بەوی تری دەوت لەسەر هیچ نیە. ئەمە لەبابی هێما و ئاماژە بۆ کردنە. جیاوازی ڕاو بۆچوون هەیە لە نێوان زانایاندا لەسەر ئەم دەقە کە خوای گەورە ئەفەرموێت: ﴿ٱلَّذِينَ لَا يَعْلَمُونَ﴾ ئەوانەی نەزانن. ڕەبیعی کوڕی ئەنەس و قەتادە دەڵێن: فەلەکان هەر قسەی جوولەکەکان دەکەن و دەیڵێنەوە[1]. ئیبنو جورەیج ئەڵێت: وتم بە عەتا: ئەوانە کێن کە نەزانن؟ وتی: چەند ئومەتێ بوون پێش فەلە و جوولەکە و لە پێش تەورات و ئینجیل[2]. سوددی ئەڵێت: ﴿قَالَ ٱلَّذِينَ لَا يَعْلَمُونَ﴾ نەزانەکانیش هەر ئەوە دەڵێن. ئەوە عەرەبەکانن وتیان موحەمەد(ﷺ) لەسەر هیچ نیە. ئەبو جەعفەری کوڕی جەریر ئەڵێت: گشتگیرە و هەموو لایەك دەگرێتەوە لێرەدا بەڵگەیەکی تەواو نیە کە یەکێ لەم ڕایانە دیاری بکا، بۆیە هەموو لایەك بگرێتەوە چاکترە والله أعلم. وە ئەفەرموێت: ﴿فَٱللَّهُ يَحْكُمُ بَيْنَهُمْ يَوْمَ ٱلْقِيَٰمَةِ فِيمَا كَانُوا۟ فِيهِ يَخْتَلِفُونَ﴾ خودا لە ڕۆژی قیامەتا لە نێوانیا بڕیار ئەدات لەو شتانەی کە تیایدا ناکۆك و جیاواز بوون. واتە: خودا لە ڕۆژی قیامەتدا کۆیان دەکاتەوە و بە بڕیاری دادوەرانەی خۆی کێشەکانیان بۆ چارەسەر دەکا کە بەئەندازەی گەردیلەیەك ستەم و ناهەقیان لەگەڵ ناکا. ئەم ئایەتە وەك ئەو ئایەتە وایە لە سوورەتی حەجدا کە ئەفەرموێت: ﴿إِنَّ ٱلَّذِينَ ءَامَنُوا۟ وَٱلَّذِينَ هَادُوا۟ وَٱلصَّٰبِـِٔينَ وَٱلنَّصَٰرَىٰ وَٱلْمَجُوسَ وَٱلَّذِينَ أَشْرَكُوٓا۟ إِنَّ ٱللَّهَ يَفْصِلُ بَيْنَهُمْ يَوْمَ ٱلْقِيَٰمَةِ إِنَّ ٱللَّهَ عَلَىٰ كُلِّ شَىْءٍ شَهِيدٌ﴾[3] ئەوانەی بڕوایان هێناو ئەوانە بونە جوولەکەو سوبیی و مەسیحی و مەجوسی و ئەو کەسانەش شەریك بۆ خودا دادەنێن، دیارە خودا ڕۆژی قیامەت بە کاری هەموویان ڕادەگا، دیارە خودا لە هەموو شت ئاگادارە. وەك لە ئایەتێکی تریشا ئەفەرموێت: ﴿قُلْ يَجْمَعُ

---

[1] ابن ابی حاتم /١/٣٤١.

[2] ابن ابی حاتم /١/٣٤٠.

[3] الحج ١٧.

بَيْنَنَا رَبُّنَا ثُمَّ يَفْتَحُ بَيْنَنَا بِالْحَقِّ وَهُوَ الْفَتَّاحُ الْعَلِيمُ﴾[1] تۆ بڵێ: پەروەردگارمان لێکترمان کۆ دەکاتەوە، پاشان هەرچۆنێ ڕاستە، ئاوا بەناومان ڕادەگا، خۆی زانایە و هەر ئەو بە کاران ڕادەگا.

﴿وَمَنْ أَظْلَمُ مِمَّن مَّنَعَ مَسَاجِدَ اللَّهِ أَن يُذْكَرَ فِيهَا اسْمُهُ وَسَعَىٰ فِي خَرَابِهَا ۚ أُولَٰئِكَ مَا كَانَ لَهُمْ أَن يَدْخُلُوهَا إِلَّا خَائِفِينَ ۚ لَهُمْ فِي الدُّنْيَا خِزْيٌ وَلَهُمْ فِي الْآخِرَةِ عَذَابٌ عَظِيمٌ ﴿١١٤﴾﴾

**ستەماکاری کەسێ ڕێگە نەدا لە مزگەوتەکاندا ناوی خودا ببرێ و هەوڵیش بدا وێران بن**

خودای گەورە ئەفەرموێت: ﴿وَمَنْ أَظْلَمُ مِمَّن مَّنَعَ مَسَاجِدَ اللَّهِ أَن يُذْكَرَ فِيهَا اسْمُهُ وَسَعَىٰ فِي خَرَابِهَا﴾ کێ ستەمکار ترە لەو کەسەی ڕێگە نەدا ناوی خودا لە ناو مزگەوتەکانی خوادا بهێنرێ و هەوڵیش بدا وێران بن؟ مەبەست بەو کەسانەی ڕێگریان کردووە لە مزگەوتەکانی خوادا یادی خودا بکرێ و هەوڵیشیان داوە وێران ببێ بتپەرستەکانی قورەیش، وەك ئیبنو جەریر ڕیوایەتی کردووە لە ئیبنو زەیدەوە لەم ئایەتەدا ئەڵێت: ئەو بتپەرستانە کە بوبونە ڕێگری پێغەمبەری خودا(ﷺ) لە ڕۆژی حودەیبیەدا کە بچێتە ناو شاری مەککە تا ئەوە بوو قوربانیەکانی لە زی توا سەربڕی و لەگەڵیان ڕێکەوت و فەرمووی پێیان: هیچ کەسێ نەبوەتە ڕێگر لەم ماڵە واتە: لە کەعبەی پیرۆز پیاوی وابووە گەیشتووە بە بکوژی باوکی یان برای خۆی ڕێگری لێ نەکردووە، کەچی ئەمانە وتیان: نابێ کەسێ بێتە ناومان کە باب و باپیرانمانیان کوشتووە لە ڕۆژی بەدردا لە ناوماندا بمێنێتەوە، وە﴿وَسَعَىٰ فِي خَرَابِهَا﴾ هەوڵی داوە وێران ببێ. وتی: کاتێ کەڕێگەیان بڕی لەو کەسانەی ئاوەدانی دەکەنەوە بە یادی خوداو دێن بۆ حەج و عەمرە بۆی[2]. ئیبنو ئەبی حاتەم ڕیوایەتی کردووە لە ئیبنوعەباسەوە کەقورەیشیەکان نەیان هێشت پێغەمبەری خودا(ﷺ) نوێژ لەلای کەعبەی پیرۆز بکا لە المسجد الحرامدا خودای مەزن ئەم ئایەتەی ناردە خوارەوە: ﴿وَمَنْ أَظْلَمُ مِمَّن مَّنَعَ مَسَاجِدَ اللَّهِ أَن يُذْكَرَ فِيهَا اسْمُهُ﴾[3] کێ ستەمکار ترە لەو کەسەی کە ڕێگە نەدا ناوی خودا لە مزگەوتەکانی خوادا بهێنرێ و هەوڵیش بدا وێران بن. وەك چۆن خودای گەورە ڕووی زەمی کردە جوولەکە و مەسیحیەکان، دێتە سەر زەمی بتپەرستەکان کە پێغەمبەرو(ﷺ) هاوەڵەکانی لە مەککە وەدەر ناو نەیان دەهێشت لە ماڵی خودا نوێژ بکەن بەسەریدا زاڵ بوون و بتەکانیان لەوێ دانابوو. وەك خودای گەورە ئەفەرموێت: ﴿وَمَا لَهُمْ أَلَّا يُعَذِّبَهُمُ اللَّهُ وَهُمْ يَصُدُّونَ عَنِ

---

[1] السباء ٢٦.

[2] الطبری /٢/٥٢١ ص٩٢.

[3] ابن ابی حاتم /١/٣٤١.

ٱلْمَسْجِدِ ٱلْحَرَامِ وَمَا كَانُوٓاْ أَوْلِيَآءَهُۥٓ ۚ إِنْ أَوْلِيَآؤُهُۥٓ إِلَّا ٱلْمُتَّقُونَ وَلَٰكِنَّ أَكْثَرَهُمْ لَا يَعْلَمُونَ ﴾[1] خودا چۆن ئازاریان نەدا، کە ئەوانە ڕێگەی مسجد الحرامیان لە زیارەت کاران گرتووەو شایستەشن خاوەنی بن؟ خاوەنانی هەردەبێ ئەو کەسانە بن کە ترسی خودایان هەیە، بەلاّم زۆربەیان نەزانن. وە ئەفەرموێت: ﴿ مَا كَانَ لِلْمُشْرِكِينَ أَن يَعْمُرُواْ مَسَٰجِدَ ٱللَّهِ شَٰهِدِينَ عَلَىٰٓ أَنفُسِهِم بِٱلْكُفْرِ ۚ أُوْلَٰٓئِكَ حَبِطَتْ أَعْمَٰلُهُمْ وَفِى ٱلنَّارِ هُمْ خَٰلِدُونَ ﴿١٧﴾ إِنَّمَا يَعْمُرُ مَسَٰجِدَ ٱللَّهِ مَنْ ءَامَنَ بِٱللَّهِ وَٱلْيَوْمِ ٱلْءَاخِرِ وَأَقَامَ ٱلصَّلَوٰةَ وَءَاتَى ٱلزَّكَوٰةَ وَلَمْ يَخْشَ إِلَّا ٱللَّهَ ۖ فَعَسَىٰٓ أُوْلَٰٓئِكَ أَن يَكُونُواْ مِنَ ٱلْمُهْتَدِينَ ﴾[2] مزگەوتی خودا ئاوەدان کردن بۆ بتپەرستان نەشیاوە، خۆیان دەڵێن: خوانەناسین، هەرچی دەکەن بە فیڕۆ دەچێ و تا سەر لە جەهەنەم دەبن. هەر ئەوانە بۆیان هەیە مزگەوتی خوا ئاوا بکەن کە باوەڕیان بە خودا و ڕۆژی قیامەت هەیە و نوێژدەکەن و زەکات ئەدەن لە خوا نەبێ ترسیان لە هیچ کەس نیە، بەڵکو ئەمانە لە ڕێ زانەکان بن. وە ئەفەرموێت: ﴿ هُمُ ٱلَّذِينَ كَفَرُواْ وَصَدُّوكُمْ عَنِ ٱلْمَسْجِدِ ٱلْحَرَامِ وَٱلْهَدْىَ مَعْكُوفًا أَن يَبْلُغَ مَحِلَّهُۥ ۚ وَلَوْلَا رِجَالٌ مُّؤْمِنُونَ وَنِسَآءٌ مُّؤْمِنَٰتٌ لَّمْ تَعْلَمُوهُمْ أَن تَطَـُٔوهُمْ فَتُصِيبَكُم مِّنْهُم مَّعَرَّةٌۢ بِغَيْرِ عِلْمٍ ۖ لِّيُدْخِلَ ٱللَّهُ فِى رَحْمَتِهِۦ مَن يَشَآءُ ۚ لَوْ تَزَيَّلُواْ لَعَذَّبْنَا ٱلَّذِينَ كَفَرُواْ مِنْهُمْ عَذَابًا أَلِيمًا ﴾[3] هەر ئەوان بوون خوانەناس بوون و بوونە ڕێگرو نەیان هێشت بچنە کەعبەی پیرۆز، ڕێشیان نەدا قوربانیەکان کە گلتان دابوەوە بگاتە شوێنی خۆی، ئەگەر ئیزنمان بدایە لەمەککە بچێ بەگژیاندا، لەوانە بوو زۆر پیاوو ژنی بڕوادار کە ئێوە نەتان دەناسین لەبەر پێی ئێوەدا لەناو بچن بێ ئەوەی خۆتان بزانن،بەو هۆیەوە توشی تاوان دەبوون. خودا هەرکەسێ خۆی ویستی لێبێ دەیخاتە بەر بەزەیی خۆی، ئەگەر لەو شوێنە لاچونایە، بێگومان خوانەناسانمان بە ئازارێکی بە ژان دووچار دەکرد. وە ئەفەرموێت: ﴿ إِنَّمَا يَعْمُرُ مَسَٰجِدَ ٱللَّهِ مَنْ ءَامَنَ بِٱللَّهِ وَٱلْيَوْمِ ٱلْءَاخِرِ وَأَقَامَ ٱلصَّلَوٰةَ وَءَاتَى ٱلزَّكَوٰةَ وَلَمْ يَخْشَ إِلَّا ٱللَّهَ ﴾ هەر ئەوانە بۆیان هەیە مزگەوتی خودا ئاوا بکەن کە باوەڕیان بە خودا و ڕۆژی قیامەت هەیە و نوێژ دەکەن و زەکات ئەدەن لە خوا نەبێ ترسیان لە هیچ کەس نیە، مەبەست بە ئاوەدان کردنەوەی تەنیا دروست کردن و ڕازاندنەوەی نیە، بەڵکو ئاوەدان کردنەوەیەتی بە یادی خوداو بەجێ هێنانی پەیامی ئەوەو پاك ڕاگرتنیەتی لە بتپە رستی و چڵك و چەپەڵی.

---

[1] الانفال ٣٤.

[2] توبة ١٧–١٨.

[3] الفتح ٢٥.

## مزگێنی دان بە سەرکەوتنی ئیسلام

خودای گەورە ئەفەرموێت: ﴿أُوْلَٰٓئِكَ مَا كَانَ لَهُمْ أَن يَدْخُلُوهَآ إِلَّا خَآئِفِينَ﴾ نەدەبوایە ئەمانە هەر بچنە ناویان مەگین بە ترس و لەرزەوە. ئەمە ئاگاداریە مانای داوای تێدایە، واتە: ڕێگەی ئەوانە مەدەن بچنە ناوی ئەگەر دەسەلاتتان هەبوو بەسەریاندا مەگین کاتێ کە ڕێکەوتبن و سەرانەیان لێوەردەگرن. هەر بۆیە کاتێ کە پێغەمبەری خودا(ﷺ) مەککەی پیرۆزی ڕزگار کرد، فەرمانی دا لە سالی دوایدا کە سالی نۆهەمی کۆچی بوو، کە بانگەواز بکرێ لە میناداا: ئەوسا بزانن دوای ئەم سالْ بتپەرست بۆی نیە حەج بکا، وە بۆی نیە بەڕوتی تەوافی کەعبەی پیرۆز بکا. هەرکەسێ ماوەی هەیە، ماوەکەی تا ئەو کاتەیە کە هەیەتی[1]. ئەمەیش بۆ سەلماندن و کارکردنە بەو ئایەتە کە خودای گەورە ئەفەرموێت: ﴿يَٰٓأَيُّهَا ٱلَّذِينَ ءَامَنُوٓاْ إِنَّمَا ٱلْمُشْرِكُونَ نَجَسٌ فَلَا يَقْرَبُواْ ٱلْمَسْجِدَ ٱلْحَرَامَ بَعْدَ عَامِهِمْ هَٰذَا﴾[2] ئەی ئەوانەی خاوەنباوەڕن! ئەو کەسانەی شەریك بۆ خودا دادەنێن ناپاکن نابێ پاش ئەم سالْ لە مسجد الحرام خۆ نزیك کەنەوە. وتراوە ئەم مژدەیە کە لەلایەن خوداوە بۆ مسولْمانان کە بەو زوانە خودا مسجد الحرام دەخاتە دەستیان گشت مزگەوتەکانی تریش هەر بەو جۆرە و بتپەرستان سەر شۆڕو زەلیل دەکا. تا وای لێ دێ هیچ بتپەرستێ ناچێتە مسجد الحرام بە ترسو لەرزەوە نەبێ، خودای مەزن ئەو بەلێنەی خۆی بەجێ هێنا، وەك لە پێشەوە باس کرا کە نابێ بتپەرستان بچنە ناو مسجد الحرام وە پێغەمبەری خوا(ﷺ) ڕای سپارد کە دەبێ لە دوورگەی عەرەبیدا دوو ئاین نەبێ وجوولەکەو مەسیحیەکان تێدا بڕۆن. سوپاس و ستایش بۆ خودای مەزن. ئەمەیش هەر بۆ ڕێز لێنانی کەعبەی پیرۆز و پاك کردنەوەی ئەو شوێنە کە پێغەمبەری (ﷺ) تیا ڕەوانە کراوە بۆ خەلْکی بە گشتی، مژدە دەرو ترسێنەر بێ بۆیان. ئائەمەیە سەرشۆڕی و زەلیلی کە توشیان هات هەر لە دنیادا، چونکە پاداشت لە جۆری کردارە، وەك چۆن ئەوان ڕێیان گرت لە خاوەنباوەڕان کە بچنە مسجد الحرام قەدەغەیان کرد لێیان. هەر بەو جۆرەیش لەوان قەدەغە کرا و وەك ئەوان خاوەن باوەڕانیان تیا دەرکرد، ئەوانیش دەرکران: ﴿وَلَهُمْ فِى ٱلْءَاخِرَةِ عَذَابٌ عَظِيمٌ﴾ لە قیامەتیش ئازاری دژواریان هەیە. لەسەر ئەو سنوور شکاندنەیان دەربارەی کەعبەی پیرۆز و دانانی بت و بت خانە بەدەوریدا و پاڕانەوە لە غەیرەز خودا لەوێدا و تەواف کردن بەدەوری کەعبەدا بەڕوتی و چەندین شتی تریش لەوانەی کە خودا و پێغەمبەرەکەی (ﷺ) پێیان خۆش نەبووە. فەرمودە هاتووە لەبارەی پەنا گرتن بە خودا لە سووکی و ڕسوایی بوون لە دنیا و لە سزای سەختیش لە قیامەتا. وەك ئیمامی ئەحمەد ڕیوایەتی

---

[1] فتح الباري /٣/٥٦٥.

[2] توبة ٢٨.

کردووە لە بوسری کوڕی ئەوتارەوە وتی: پێغەمبەری خودا دوعای دەکرد و ئەیفەرموو: ئەی خودایە! ئاکاممان بەچاك بگێرە لە هەموو کارێکا، وە ڕزگارمان بکە لە سووکی و ڕیسوایی دنیاو سزای ڕۆژی دوایی[1]. ئەم فەرموودە فەرمودەیەکی حەسەنە.

﴿وَلِلَّهِ ٱلْمَشْرِقُ وَٱلْمَغْرِبُ فَأَيْنَمَا تُوَلُّوا فَثَمَّ وَجْهُ ٱللَّهِ إِنَّ ٱللَّهَ وَاسِعٌ عَلِيمٌ ﴿١١٥﴾﴾

## ڕووکردنە قیبلە لە نوێژەکاندا

خودای گەورەئەفەرموێت: ﴿وَلِلَّهِ ٱلْمَشْرِقُ وَٱلْمَغْرِبُ فَأَيْنَمَا تُوَلُّوا فَثَمَّ وَجْهُ ٱللَّهِ إِنَّ ٱللَّهَ وَاسِعٌ عَلِيمٌ﴾ خۆرهەلات و خۆرئاوا هەردوو هی ئەون، ڕووبکەنە هەر لایەك خودا لەوێیە زانستی خودا بەربلاوو ئاگادارە. ئەمە والله أعلم دلدانەوەی پێغەمبەرو(ﷺ) هاوەلەکانیەتی کە دەرکران لە مەککە و دورکەوتنەوەلەمزگەوت و شوێن نوێژەکەیان و لێی جیابوونەوە. پێغەمبەری خودا(ﷺ) لە مەککە ڕوەو قودسی پیرۆز نوێژی دەکرد، کەعبەی پیرۆزیش لەلایدا بوو، کاتێ کە گەیشتە مەدینە، شانزە یان حەڤدە مانگ ڕوی لە قودسی پیرۆز بوو لە نوێژدا، دوای ئەوە خودای گەورە ڕوی وەرچەرخان ڕوەو کەعبەی پیرۆز. هەربۆیە ئەفەرموێت: ﴿وَلِلَّهِ ٱلْمَشْرِقُ وَٱلْمَغْرِبُ فَأَيْنَمَا تُوَلُّوا فَثَمَّ وَجْهُ ٱللَّهِ﴾ خۆرهەلات و خۆرئاوا هەردوو هەر هی خودان ڕوبکەنە هەرلایەك خودا لەوێیە. عەلی کوڕی ئەبو تەلحە ئەلێت لە ئیبنو عەباسەوە ئەلێت: یەکەم شتێ کە نەسخ کراوەتەوە لە قورئاندا قیبلە بووە. چونکە پێغەمبەری خودا(ﷺ) کاتێ کە کۆچی کرد بۆ مەدینە خەلکەکەی جوولەکە بوون خودا فەرمانی دا ڕوویکاتە قودسی پیرۆز، جوولەکەکان زۆر دلخۆش بوون. پێغەمبەری خودا(ﷺ) شانزدە یان حەڤدە مانگ ڕووی لەوێ کرد. پێغەمبەری خوا(ﷺ) قیبلەی ئیبراهیمی پێخۆش بوو، دوعای دەکردو سەیری ئاسمانی دەکرد خودای گەورە ئەم ئایەتەی ناردە خوارەوە: ﴿قَدْ نَرَىٰ تَقَلُّبَ وَجْهِكَ فِي ٱلسَّمَاءِ﴾ تۆمان دیوە کە بەرەو ئاسمان دەڕوانی، تا دەگاتە: ﴿فَوَلُّوا وُجُوهَكُمْ شَطْرَهُ﴾[2] با ڕوتان هەر لەوێ بێ جوولەکەکان کەوتنە گومانەوەو وتیان: چی ئەوانی وەرگێڕا لەو قیبلەیە لە پێشا ڕوویان تێدەکرد، خودای مەزن ئەم ئایەتەی ناردە خوارەوە: ﴿قُل لِّلَّهِ ٱلْمَشْرِقُ وَٱلْمَغْرِبُ﴾بلێ: خۆرهەلات و خۆرئاوا مولکی خودان. وە فەرموی: ﴿فَأَيْنَمَا تُوَلُّوا فَثَمَّ وَجْهُ ٱللَّهِ﴾[3] ڕوو بکەنە هەرلایەك خودا لەوێیە. عیکرەمە لە ئیبنو عەباسەو ئەلێت: ﴿فَأَيْنَمَا تُوَلُّوا فَثَمَّ وَجْهُ ٱللَّهِ﴾ ڕووبکەنە هەرلایەك خودا لەوێیە. وتی: ڕوو لەهەر لایەك بکەی

---

[1] أحمد /٤/١٨١ ص٩٣.

[2] البقرة ١٤٤-١٥٠.

[3] الطبری /٢/٥٢٧.

خۆرئاوا یان خۆرهەلآت قیبلەی خودایە[1]. موجاهید ئەڵێت: ﴿فَأَيْنَمَا تُوَلُّوا فَثَمَّ وَجْهُ اللَّهِ﴾ ڕووبکەنە هەرلایەك خودا لەوێیە. لەهەر کوێیەك بن قیبلەیەکتان هەیە ڕووی تێبکەن کە کەعبەیە[2]. وتراوە: ئەم ئایەتە هاتە خوارەوە لە پێش ئەوەدا کە ڕوکردنە قیبلە فەرز بکرێ. ئیبنو جەریر و کەسانی تریش هەر وتویانە: ئەم ئایەتە هاتە خوارەوە بۆ پێغەمبەری خودا(ﷺ) ئیزنێك بوو لەلایەن خوداوە بۆ ئەو کەسانەی نوێژی سونەت دەکەن دەتوانن ڕوو لەهەر کوێیەك بکەن بەرەو ڕۆژهەلآت یان ڕۆژئاوا لە کاتی بەردەوام بوونیان لە ڕۆشتن لە سەفەردا یان لەکاتی شەڕو ترسدا[3]. لە ئیبنو عومەرەوە کە ئەو وڵاغەکەی بەرەو هەر شوێنێك بڕۆشتایە نوێژی دەکرد و دەیوت کە پێغەمبەری خودا(ﷺ) وای دەکرد. ئەم ئایەتەی: ﴿فَأَيْنَمَا تُوَلُّوا فَثَمَّ وَجْهُ اللَّهِ﴾ ڕوو بکەنە هەر لایەك خودا لەوێیە، وا تەفسیری دەکرد[4]. موسلیم و تەرمیزی و نەسائی و ئیبنو ئەبی حاتەم و ئیبنو مەردەویهی ڕیوایەتیان کردووە، ئەسڵی ئەم فەرمودەیە لەهەر دوو سەحیحەکەدا هاتووە لە فەرمودەکەی ئیبنو عومەر و عامیری کوڕی ڕەبیعەوە، بەبێ باس و هێنانی ئایەتەکە[5]. وە لە سەحیحی بوخاریدا لە فەرمودەکەی نافعەوە لە ئیبنو عومەرەوە کاتێ کە پرسیاری نوێژی ترسی لێبکرایە وەسفی دەکرد پاشان دەیوت: کاتێ کە ترس لەوە زۆرتربوایە پیاوەکان بە پێوە نوێژیان دەکرد و سوارەکانیش بە ڕوو لە قیبلە و بە پشت لە قیبلە نوێژیان دەکرد. نافیع ئەڵێت: من وانازانم ئیبنو عومەر باسی ئەوەی کردبێ کە کردویەتی مەگین لە پێغەمبەرەوە بووە(ﷺ)[6]. وتراویشە: ئەم ئایەتە هاتە خوارەوە لەسەر ئەوانەی قیبلەیان لێتێك چوو بوو لەبەر تاریکی و هەور ڕویان لە غەیرەز قیبلە کردبوو.

## قیبلەی خەڵکی مەدینە لە نێوان خۆرهەلآت و خۆرئاوادایە

حافیز ئەبو بەکری کوڕی مەردەویهی لە تەفسیری ئەم ئایەتەدا لە ئەبو هورەیرەوە هێناویەتی ئەڵێت: پێغەمبەری خودا(ﷺ) فەرمویەتی: لە نێوان خۆرهەلآت و خۆرئاوادا قیبلەیە بۆ خەڵکی مەدینەو خەڵکی شام و خەڵکی عێراق[7]، لێرەدا موناسەبەیەك هەبوە. وە تیرمزی و ئیبنو ماجەش بەم

---

[1] ابن ابی حاتم /١/٣٤٧.
[2] ابن ابی حاتم /١/٣٤٥.
[3] الطبری /٢/٥٣٠.
[4] الطبری /٢/٥٣٠.
[5] مسلم/١/٤١٦/، تحفة الاحوذی/١/٢٩٢/، النسائی/١/٢٤٤/، ابن ابی حاتم/١/٣٤٤/، الحاکم/٢/٢٦٦.
[6] فتح الباری /٨/٤٦.
[7] العقیلی /٤/٣٠٩ ص٩٤.

وتەیە هێناویانە: لە نێوان خۆرهەلات و خۆرئاوادا قیبلەیە[1]. ئیبنو جەریر ئەلێت: مانای ئەم دەقە کە خوای گەورە ئەفەرموێت: ﴿إِنَّ ٱللَّهَ وَٰسِعٌ عَلِيمٌ﴾ خودای مەزن زانستی بەبلاوە دەربارەی دروستکراوەکانی بە تەواوی و خێرو بێری ڕژاندوە بەسەریاندا، بەلام ﴿عَلِيمٌ﴾ واتە: ئاگاداری کردارەکانیانە هیچی لێ ناشاردرێتەوەو لێی ون نابێ، بەلکو ئاگاداری هەموو کردارەکانە[2].

﴿وَقَالُواْ ٱتَّخَذَ ٱللَّهُ وَلَدًاۗ سُبۡحَٰنَهُۥۖ بَل لَّهُۥ مَا فِي ٱلسَّمَٰوَٰتِ وَٱلۡأَرۡضِۖ كُلّٞ لَّهُۥ قَٰنِتُونَ (١١٦) بَدِيعُ ٱلسَّمَٰوَٰتِ وَٱلۡأَرۡضِۖ وَإِذَا قَضَىٰٓ أَمۡرٗا فَإِنَّمَا يَقُولُ لَهُۥ كُن فَيَكُونُ (١١٧)﴾

**وەلام دانەوەی ئەوانەی کە دەلێن: خودا مندالی هەیە**

خودای گەورە ئەفەرموێت: ﴿وَقَالُواْ ٱتَّخَذَ ٱللَّهُ وَلَدًاۗ سُبۡحَٰنَهُۥۖ بَل لَّهُۥ مَا فِي ٱلسَّمَٰوَٰتِ وَٱلۡأَرۡضِۖ كُلّٞ لَّهُۥ قَٰنِتُونَ﴾ وتیان: خودا بۆخۆی مندالی هەلبژاردووە! خودا لەو شتان پاکە، بەلکو هەرچی لە ئاسمانەکان و زەمینە هەموو بۆ ئەوە و گشتی بەرفەرمانی ئەون. ئەم ئایەتەو ئەو ئایەتەیش کە بە دوایدا هاتووە پێك هاتووە لە وەلام دانەوەی گاورەکان بەر نەفرینی خودا کەون. ئەوانەش پێ و ڕچەی ئەوانیان گرتۆتە بەر لە جوولەکە و لە بتپەرستانی عەرەب. ئەوانەی کە فریشتەکانیان کردبووە کچی خودا. خودای گەورە هەموویانی بە درۆ خستەوەو لەو قسەو باسەیاندا کە دەیان وت: خودا فەرزەندەی هەیە و فەرموی: ﴿سُبۡحَٰنَهُۥ﴾ پاك و بێعەیبی بۆ خودایە، دورە لەم قسانەوە ئەوانە کردویانە و هەلیان بەستووە: ﴿بَل لَّهُۥ مَا فِي ٱلسَّمَٰوَٰتِ وَٱلۡأَرۡضِ﴾ بەلکو هەرچی لە ئاسمانەکان و زەمینە هەمووی بۆ ئەوە واتە: بەو جۆرە نیە ئەوان هەلیان بەستووەو وتویانە، بەلکو هەرچی لە ئاسمانەکان و زەمینەو ئەوەش لە نێوانیاندایە هی ئەوەو خۆی سەرپەرشتیان دەکا و خۆی وەدی هێنەرو ڕۆزی دەریانە و ڕامی کردوون بە ویستی خۆی دەیان بات و دەیان هێنێ هەموو عەبدی ئەون و خۆی خاوەنیانە. کەوایە چۆن دەبێ لەوان فەرزەندی هەبێ. چونکە مندال دەبێ لە دوو شتی گونجاو پەیدا ببێ. خۆ خودای مەزن هاو شێوە و هاوکاری نیە لە گەورەیی وپایە بەرزیدا و هاوسەری نیە، چۆن دەبێ فەرزندی ببێ؟ وەك خودای گەورە ئەفەرموێت: ﴿بَدِيعُ ٱلسَّمَٰوَٰتِ وَٱلۡأَرۡضِۖ أَنَّىٰ يَكُونُ لَهُۥ وَلَدٞ وَلَمۡ تَكُن لَّهُۥ صَٰحِبَةٞۖ وَخَلَقَ كُلَّ شَيۡءٖۖ وَهُوَ بِكُلِّ شَيۡءٍ عَلِيمٞ﴾[3] داهێنەری ئاسمانەکان و زەمینە، چۆن دەبێ فەرزندی هەبێ؟ کە هیچ ژنی

---

[1] تحفة الاحوذی /٢/٣١٧/، ابن ماجة/١/٣٢٣/، حه سه نی سه حیحه.

[2] الطبری /٢/٥٣٧.

[3] الانعام ١٠١.

ئەمێناوەو هەرچی هەیە هەموو دەستکردی خۆیەتی و ئاگای لە هەموو شت هەیە. وە ئەفەرموێت: ﴿وَقَالُوا اتَّخَذَ الرَّحْمَٰنُ وَلَدًا ﴿٨٨﴾ لَقَدْ جِئْتُمْ شَيْئًا إِدًّا ﴿٨٩﴾ تَكَادُ السَّمَاوَاتُ يَتَفَطَّرْنَ مِنْهُ وَتَنشَقُّ الْأَرْضُ وَتَخِرُّ الْجِبَالُ هَدًّا ﴿٩٠﴾ أَن دَعَوْا لِلرَّحْمَٰنِ وَلَدًا ﴿٩١﴾ وَمَا يَنبَغِي لِلرَّحْمَٰنِ أَن يَتَّخِذَ وَلَدًا ﴿٩٢﴾ إِن كُلُّ مَن فِي السَّمَاوَاتِ وَالْأَرْضِ إِلَّا آتِي الرَّحْمَٰنِ عَبْدًا ﴿٩٣﴾ لَقَدْ أَحْصَاهُمْ وَعَدَّهُمْ عَدًّا ﴿٩٤﴾ وَكُلُّهُمْ آتِيهِ يَوْمَ الْقِيَامَةِ فَرْدًا﴾[1] وتویانە: خودا بوەتە خاوەن فەرزەند، ئای کە قسەیەکی ڕەقتان بە دەمدا هاتووە! لەوانەیە لەو قسەیەدا ئاسمانەکان هەڵتەکێن و زەمین شەق با و کێوەکان لەبەر یەك بچن، لەبەر ئەوە وتیان خودا فەرزندی هەیە. ئەوە لەخودا ناوەشێتەوە کە هیچ فەرزەندێکی هەبێ، هەرچی لەناو ئەم ئاسمان و زەمینەن هەموو گشتی بە عەبدایەتی دێنە لای خودا، هەموویانی حیساب کردوەو هەر بە هەژمار ژماردونی، سەرلەبەریان ڕۆژی قیامەت تاك و تەنیا دێنە لای ئەو. وە ئەفەرموێت: ﴿قُلْ هُوَ اللَّهُ أَحَدٌ ﴿١﴾ اللَّهُ الصَّمَدُ ﴿٢﴾ لَمْ يَلِدْ وَلَمْ يُولَدْ ﴿٣﴾ وَلَمْ يَكُن لَّهُ كُفُوًا أَحَدٌ﴾[2] بلێ: بەو خودایە کە تاکە، خودایەکی بێ نیازو جێنیازە، کەس لەو نەبوەو ئەویش لە هیچ کەس نەبووە، هەرگیز هیچ کەس هاوشێوەو هاوتای نیە، هەرچی هەیە هەموو خۆی وەدی هێناوە و وە پەروەرێنیەتی، چۆن دەبێ لەوانە فەرزەندی هەبێ؟ هەریۆیە بوخاری ڕیوایەتی کردوە لە تەفسیری ئەم ئایەتەی سوورەتی بەقەرەدا لە ئیبنو عەباسەوە لە پێغەمبەری خوداوە(ﷺ) فەرمویەتی: ئادەمیزاد درۆی دایە پاڵ من کە مافی ئەوەی نەبوو، وە جوێنی پێدام کە مافی ئەوەشی نەبوو، درۆدانە پاڵەکەی بۆ من ئەوەیە کە وادەزانێ من توانای ئەوەم نیە زیندوی بکەمەوە بەو شێوەی کە لە دونیادا هەبووە. جوێندانەکەی بە من ئەوە بووە کە دەڵێ من (خودا) کوڕی هەیە، پاك و بێگەردی بۆ من لەوەی کە کوڕم یان خێزانم هەبێ[3]. تەنیا بوخاری هێناویەتی. وە لە هەردوو سەحیحەکەدا هاتووە لە پێغەمبەری خوداوە(ﷺ) کە فەرمویەتی: هیچ کەس لە خودا خۆڕاگرتر نیە لەسەر ئازارێ کە بیستبێتی، ئەوانە فەرزەندی بۆ دادەنێن، کەچی ئەو ڕۆزیان ئەدا و تەندروستیان دەکا[4].

---

[1] مریم ٨٨-٩٥.

[2] الاخلاص ١-٤.

[3] فتح الباری /٨/١٨ ص٩٤.

[4] فتح الباری /١٣/٣٧٢، مسلم/٤/٢١٦٠.

## هەموو شتێ ملکەچ و بەرفەرمانی خودایە

خودای گەورە ئەفەرموێت: ﴿كُلٌّ لَّهُۥ قَٰنِتُونَ﴾ گشتی بەرفەرمانی ئەون، ئیبنو ئەبی حاتەم ئەڵێت: ئەبو سەعید ئەشجەع بۆی گێڕاوەتەوە، ئەسیات بۆی گێڕاینەوە لە موتەڕیفەوە لە عەتیەوە لە ئیبنو عەباسەوە ئەڵێت: ﴿قَٰنِتُونَ﴾ یانی: نوێژکران[1]. عیکرەمەو ئەبو مالیك ئەڵێن: ﴿كُلٌّ لَّهُۥ قَٰنِتُونَ﴾ هەموو دان دەنێن بە بەندایەتیدا بۆی[2]. سەعیدی کوڕی جوبەیر ئەڵێت: ﴿كُلٌّ لَّهُۥ قَٰنِتُونَ﴾ یانی: بەدڵ پاکی و دڵسۆزی[3]. ڕەبیعی کوڕی ئەنەس ئەڵێت: ﴿كُلٌّ لَّهُۥ قَٰنِتُونَ﴾ یانی: ڕاوەستان لەڕۆژی قیامەتا[4]. سوددی ئەڵێت: ﴿كُلٌّ لَّهُۥ قَٰنِتُونَ﴾ یانی: بەرفەرمانن لە ڕۆژی قیامەتا[5]. خوسەیف وتی لە موجاهیدەوە: ﴿كُلٌّ لَّهُۥ قَٰنِتُونَ﴾ بەرفەرمانن، ببن بە مرۆڤ دەبن و ببن بە گوێدرێژ دەبن[6]. ئیبنو ئەبی نەجیح وتی لە موجاهیدەوە: ﴿كُلٌّ لَّهُۥ قَٰنِتُونَ﴾ بەرفەرمانن، وتی: گوێڕایەڵی خوانەناس لە سوژدەی سێبەرەکەیەتی کە ناچارە[7]. ئەمە قسەی موجاهیدە، ئیبنو جەریریش هەمان ڕای هەڵبژاردووە. کە گشت قسەکان پێکەوە یەك دەخات کە ﴿قَٰنِتُونَ﴾ بریتیە لەبەر فەرمانی و زەلیلی دەربڕین بۆ خودای مەزن. ئەمەیش قەدەری و شەرعیشە. وەك خودای مەزن ئەفەرموێت: ﴿وَلِلَّهِ يَسْجُدُ مَن فِي ٱلسَّمَٰوَٰتِ وَٱلْأَرْضِ طَوْعًا وَكَرْهًا وَظِلَٰلُهُم بِٱلْغُدُوِّ وَٱلْأَصَالِ﴾[8] هەچی هەیە لە نێوانی ئەم ئاسمانانە و زەمینە بیانەوێ و نەیان هەوێ خۆیان و سێبەرەکانیان هەموو بەیانی و ئێواران گشتیان سوژدە بۆ خودا دەبەن.

## ماناى بەدیع

خودای گەورە ئەفەرموێت: ﴿بَدِيعُ ٱلسَّمَٰوَٰتِ وَٱلْأَرْضِ﴾ داهێنەری ئاسمانەکان و زەمینە واتە: دروستکەریان نەك لەسەر وێنەکانی پێشوو. موجاهید و سوددی ئەڵێن: ئەوە داخوازی و پێویستی زمانە وەك بە شتی داهێنراو دەوترێ: بیدعە وە لە سەحیحی موسلیمدا هاتووە: (إن كل محدثة بدعة و كل

---

[1] ابن ابی حاتم/۱/۳٤۹.
[2] ابن ابی حاتم /۱/۳٤۹.
[3] ابن ابی حاتم /۱/۳٥۰.
[4] ابن ابی حاتم /۱/۳٥۰.
[5] الطبری /۲/٥۳۸.
[6] ابن ابی حاتم /۱/۳٤۹.
[7] ابن ابی حاتم /۱/۱٤۸.
[8] الرعد ۱٥.

بدعة ضلالة) بیدعەیش دەکرێ بە دوو بەشەوە،هەندێ جار ئەو داهێنراوە داهێنراوێکی شەرعیە وەك ئەفەرموێت: (فان کل محدثة بدعة و کل بدعة ضلالة)[1]. هەندێ جار ئەو داهێنراوە لوغەویە وەك گەورەی مسوڵمانان عومەری کوڕی خەتاب دەربارەی کۆکردنەوەی هاوەڵەکانی پێغەمبەر(ﷺ)لەسەر نوێژی تەراویح بە جەماعەت و بەردەوامیان لەسەری وتی: ئەمە چاکترین داهێنراوە. ئیبنو جەریر ئەڵێت: پاکی و بێعەیبی بۆ خودایە کە فەرزەندی هەبێ؛ چونکە خودا خاوەنی هەموو شتێکە لە ئاسمانەکان و زەمیندا، هەموو شایەتی ئەدەن بە بەڵگەوە کە خودا تاك و تەنیایە و گوێڕایەڵی فەرمانی ئەون و پەروەردگارە وەدی هێنەریانە، بەبێ بنچینە و وێنەیەك کە لەسەری هێنابن ئەمە ئاگاداریەکە لە خوداوە بۆ عەبدەکانی کە ئەوانەشایەتی بۆ ئەدەن لەسەر ئەوە: کە ئەو عیسایەسەلامی خوای لێبێ پێغەمبەری خودایە. خۆشی پێیان ئەفەرموێت: ئەو کەسەی ئاسمانەکان و زەمینی داهێناوە لە نەبوون هەر ئەوە کە عیسای وەدی هێناوە بەبێ باوك بەدەسەڵاتی خۆی[2]. ئەمە قسەی ئیبنو جەریرە ڕەحمەتی خوای لێبێ قسەیەکی چاك و ڕاستە. پاشان خودای گەورە ئەفەرموێت: ﴿وَإِذَا قَضَىٰٓ أَمۡرٗا فَإِنَّمَا يَقُولُ لَهُۥ كُن فَيَكُونُ﴾ هەر کەویستی کارێ پێك بێنێ، فەرمان ئەدا: ببە! دەبێ، خودای مەزن لێرەدا تواناو دەسەڵاتی بێپایانی خۆی دەرخستووە، کە هەر بڕیارێکی داو ویستی ببێ فەرمانی پێدەکا ببێ، بەو شێوەیەی خۆی دەیەوێ دەبێت. بەیەك جا. وەك ئەفەرموێت: ﴿إِنَّمَآ أَمۡرُهُۥٓ إِذَآ أَرَادَ شَيۡـًٔا أَن يَقُولَ لَهُۥ كُن فَيَكُونُ﴾[3] هەرکاتێ شتێکی بوێ پەیدا ببێ بە فەرمان پێی دەڵێ: ببە! هەر دەست بەجێ پەیدا دەبێ. وە ئەفەرموێت: ﴿وَمَآ أَمۡرُنَآ إِلَّا وَٰحِدَةٞ كَلَمۡحِۭ بِٱلۡبَصَرِ﴾[4] کاری ئێمە یەك جارەیە و هەر لەچاو تروکانێکا کۆتایی دێ. وە دیسان ئاگاداری داوە لە دروستکردنی عیسا بە وتەی ﴿كُن﴾ پەیدا بووە بەو جۆرەی خودا فەرمانی داوەو ئەفەرموێت: ﴿إِنَّ مَثَلَ عِيسَىٰ عِندَ ٱللَّهِ كَمَثَلِ ءَادَمَۖ خَلَقَهُۥ مِن تُرَابٖ ثُمَّ قَالَ لَهُۥ كُن فَيَكُونُ﴾[5] نمونەی عیساش لەلای خودا لە چەشنی نمونەی ئادەمە هەر لەگەڵ دروستی کردو پاشان پێی ووت: ببە بە ئادەم ئەویش بوو.

---

[1] مسلم/٢/٥٩٢.

[2] الطبری /٢/٥٥٠ ص٩٥.

[3] یس ٨٢.

[4] القمر ٥٠.

[5] ال عمران ٥٩.

﴿وَقَالَ ٱلَّذِينَ لَا يَعۡلَمُونَ لَوۡلَا يُكَلِّمُنَا ٱللَّهُ أَوۡ تَأۡتِينَآ ءَايَةٞۗ كَذَٰلِكَ قَالَ ٱلَّذِينَ مِن قَبۡلِهِم مِّثۡلَ قَوۡلِهِمۡۘ تَشَٰبَهَتۡ قُلُوبُهُمۡۗ قَدۡ بَيَّنَّا ٱلۡأٓيَٰتِ لِقَوۡمٖ يُوقِنُونَ ١١٨﴾

**خوانەناسان بۆچونیان لەیەکەوە نزیکە**

﴿وَقَالَ ٱلَّذِينَ لَا يَعۡلَمُونَ لَوۡلَا يُكَلِّمُنَا ٱللَّهُ أَوۡ تَأۡتِينَآ ءَايَةٞۗ كَذَٰلِكَ قَالَ ٱلَّذِينَ مِن قَبۡلِهِم مِّثۡلَ قَوۡلِهِمۡۘ تَشَٰبَهَتۡ قُلُوبُهُمۡۗ قَدۡ بَيَّنَّا ٱلۡأٓيَٰتِ لِقَوۡمٖ يُوقِنُونَ﴾ هیچ نەزانەکان وتیان: بۆچی خوا ئێمە نادوێنێ، یان بەڵگەیەکمان بۆ نایێنێ، بەر لەوانیش هەر ئەم قسانەیان هەبووە، دیارە دڵیان لە یەکتر دەکەن، ئێمە بەڵگەکانی خۆمان نیشانی ئەوانە داوە کە ئامادەن بیسەلمێنن. موحەمەدی کوڕی ئیسحاق ڕیوایەتی کردووە لە ئیبنو عەباسەوە ئەڵێت: ڕافیعی کوڕی حیرەیمەلە وتی: بە پێغەمبەری خودا(ﷺ) فەرموی: ئەی موحەمەد! ئەگەر تۆ پێغەمبەری لەلایەن خوداوە ڕەوانە کراوی وەك دەڵێن: بڵێ بە خودا با قسەمان لەگەڵ بکا تا قسەکانی ببیستین. خودای مەزن ئەم ئایەتەی لەسەر ئەوە ناردە خوارەوە: ﴿وَقَالَ ٱلَّذِينَ لَا يَعۡلَمُونَ لَوۡلَا يُكَلِّمُنَا ٱللَّهُ أَوۡ تَأۡتِينَآ ءَايَةٞۗ﴾[1] بۆچی خودا ئێمە نادوێنێ، یان بەڵگەیەکمان بۆ نایە؟ ئەبولعالیە و ڕەبیعی کوڕی ئەنەس و قەتادە و سوددی لە تەفسیری ئەم ئایەتەدا وتیان ئەمە قسەی خوانەناسانی عەرەبە﴿كَذَٰلِكَ قَالَ ٱلَّذِينَ مِن قَبۡلِهِم مِّثۡلَ قَوۡلِهِمۡۘ﴾ بەر لەوانیش ئەم قسانەیان کردووە، وتیان: ئەمە قسەی جوولەکە و مەسیحیەکانە[2]. ئەم ئایەتانە جەخت لەسەر قسەی ئەوانە دەکاتەوە کە دەڵێن ئەوانە بتپەرستەکانی عەرەب بوون ئەو قسانەیان کردووە. خودای مەزن ئەفەرموێت: ﴿وَإِذَا جَآءَتۡهُمۡ ءَايَةٞ قَالُواْ لَن نُّؤۡمِنَ حَتَّىٰ نُؤۡتَىٰ مِثۡلَ مَآ أُوتِيَ رُسُلُ ٱللَّهِۘ ٱللَّهُ أَعۡلَمُ حَيۡثُ يَجۡعَلُ رِسَالَتَهُۥۗ سَيُصِيبُ ٱلَّذِينَ أَجۡرَمُواْ صَغَارٌ عِندَ ٱللَّهِ وَعَذَابٞ شَدِيدُۢ بِمَا كَانُواْ يَمۡكُرُونَ﴾[3] هەرکاتێ بەڵگەیەکیان بۆ بێ، دەڵێن: ئێمەش تا وەك پێغەمبەرانی خودا ئەو بەڵگانەمان بۆ نەیە بروا ناهێنین. خودا خۆی باشتر دەزانێ چ کەسێ بۆ پێغەمبەری خۆی هەڵبژێرێ، زۆری پێناچێ ئەوانەی تاوان بار بوون لەبەر فێڵبازی و دەغەڵیان لەلایەن خوداوە سووکی و ئازارێکی دژواریان تووش دەبێ. وە ئەفەرموێت: ﴿وَقَالُواْ لَن نُّؤۡمِنَ لَكَ حَتَّىٰ تَفۡجُرَ لَنَا مِنَ ٱلۡأَرۡضِ يَنۢبُوعًا﴾ وتیان: بروات پێناهێنین تا لەم

---

[1] ابن ابی حاتم /۱/۳۵۲ ص۹۵.

[2] ابن ابی حاتم /۱/۳۵۳.

[3] الانعام ۱۲٤.

زەمینە كانیەكمان بۆهەڵدەقوڵێنی تا دەكاتە: ﴿قُلْ سُبْحَانَ رَبِّي هَلْ كُنتُ إِلَّا بَشَرًا رَّسُولًا﴾[1] بڵێ: پاكی هەر بۆ پەروەردگارە كەمە، ئایا من چیم جگە ئادەمیەكی پێغەمبەر؟ وە ئەفەرموێت: ﴿وَقَالَ الَّذِينَ لَا يَرْجُونَ لِقَاءَنَا لَوْلَا أُنزِلَ عَلَيْنَا الْمَلَائِكَةُ أَوْ نَرَىٰ رَبَّنَا﴾[2] ئەوانەی بە هیوا نین بە دیداری ئێمە بگەن، وتیان: بۆچی فریشتەمان نەهاتە لایان؟ یان پەروەردگاری خۆمان نەدی؟ وە ئەفەرموێت: ﴿بَلْ يُرِيدُ كُلُّ امْرِئٍ مِّنْهُمْ أَن يُؤْتَىٰ صُحُفًا مُّنَشَّرَةً﴾[3] بەلكو هەریەك لەوانە وایان دەویست نامەی كراوەی بۆ بێنن. چەندین ئایەتی تریش كە بەڵگەن لەسەر خوانەناسی بتپەرستیەكانی عەرەب و لاساری و بەدفەڕی و پرسیاری بێ ڕێ و جێی ئەوان كە هیچ پێویستیان پێی نەبوو. وەك چۆن گەلەكانی پێش ئەمان لە گاورو جوولەكە و كەسانی تریش پرسیاریان دەربارەی كردبوو. وەك خودای مەزن ئەفەرموێت: ﴿يَسْأَلُكَ أَهْلُ الْكِتَابِ أَن تُنَزِّلَ عَلَيْهِمْ كِتَابًا مِّنَ السَّمَاءِ ۚ فَقَدْ سَأَلُوا مُوسَىٰ أَكْبَرَ مِن ذَٰلِكَ فَقَالُوا أَرِنَا اللَّهَ جَهْرَةً﴾[4] ئەوانەی ئەهلی كتێبن، لێت دەپرسن: كتێبێكیان بەتایبەتی لە ئاسمانەوە بۆ بێنی، هەر ئەوان ئەوەی لە مووسایان دەویست زۆر لەوەیش گرنگتر بوو، وتیان: خوامان بە ئاشكرا پێ نیشان بدە. وە ئەفەرموێت: ﴿وَإِذْ قُلْتُمْ يَا مُوسَىٰ لَن نُّؤْمِنَ لَكَ حَتَّىٰ نَرَى اللَّهَ جَهْرَةً﴾[5] ئەوهاش بە مووساتان وت: ئێمە بڕوات پێناهێنین تا بەئاشكرا خودا نەبینین. پاشان خودای گەورە ئەفەرموێت: ﴿تَشَابَهَتْ قُلُوبُهُمْ﴾ دڵەكانیان لە یەك دەچێت. واتە: دڵی بتپەرستەكانی عەرەب لە دڵی خوانەناسانی پێشوو دەچیّ لە خوانەناسی و لاساری و خراپیدا. وەك خودای مەزن ئەفەرموێت: ﴿كَذَٰلِكَ مَا أَتَى الَّذِينَ مِن قَبْلِهِم مِّن رَّسُولٍ إِلَّا قَالُوا سَاحِرٌ أَوْ مَجْنُونٌ ﴿٥٢﴾ أَتَوَاصَوْا بِهِ﴾[6] بەرلەمانەش هەروابووە، هەركاتیّ پێغەمبەرێكیان بۆ هاتووە، وتوویانە: یان جادوو گەر یان شێتە. مەگەر ئەوان یەكتریان بەو قسە ڕاسپاردووە؟ نە وانیە بەڵكو ئەوان هەر بۆخۆیان گەلانێكی نافەرمان بوون. خودای گەورە لێرەدا ئەفەرموێت: ﴿قَدْ بَيَّنَّا الْآيَاتِ لِقَوْمٍ يُوقِنُونَ﴾ ئێمە نیشانەكانی خۆمان نیشانی ئەوانە داوە كە یەقینیان هەیە و ئامادەن

---

[1] الاسراء ٩٠-٩٣.
[2] الفرقان ٢١.
[3] المدثر ٥٢.
[4] النساء ١٥٣.
[5] البقرة ٥٥.
[6] الذاريات ٥٢-٥٣.

بیسەلمێنن. واتە: ئێمە نیشانەکانی خۆمان ڕوون کردوەتەوە لەسەر ڕاستی ئەو پێغەمبەرانە، پێویست بە پرسیاری تر ناکا بیکات بۆ کەسێ کە بڕوای تەواوی هەبێ و شوێنی پێغەمبەران کەوتبێ و شارەزای ئەو پەیامە بێ کە پێی هاتووە. بەڵام ئەوکەسانەی کە خودا مۆری نابێ بەسەر دڵ و گیانیاندا و پەردەی هێنابێ بەسەر چاویاندا، ئەوانە خودای گەورە دەربارەیان ئەفەرموێت: ﴿إِنَّ ٱلَّذِينَ حَقَّتْ عَلَيْهِمْ كَلِمَتُ رَبِّكَ لَا يُؤْمِنُونَ ﴿٩٦﴾ وَلَوْ جَآءَتْهُمْ كُلُّ ءَايَةٍ حَتَّىٰ يَرَوُا۟ ٱلْعَذَابَ ٱلْأَلِيمَ﴾[1] ئەو کەسانەی گفتی پەروەردگاری تۆیان لێهاتە دی، ئیتر باوەڕ ناهێنن، جابا هەموو نیشانەیەکیشیان بۆ بێ، تا ئازاری بەژان بە چاوی خۆیان دەبینن.

﴿إِنَّآ أَرْسَلْنَٰكَ بِٱلْحَقِّ بَشِيرًا وَنَذِيرًا ۖ وَلَا تُسْـَٔلُ عَنْ أَصْحَٰبِ ٱلْجَحِيمِ ﴿١١٩﴾﴾

**ئەی موحەممەد(ﷺ) تۆ تەنیا مژدەدەر و ترسێنەری**

خودای گەورە ئەفەرموێت: ﴿إِنَّآ أَرْسَلْنَٰكَ بِٱلْحَقِّ بَشِيرًا وَنَذِيرًا ۖ وَلَا تُسْـَٔلُ عَنْ أَصْحَٰبِ ٱلْجَحِيمِ﴾ ئێمە تۆمان بە ڕاست و ڕەوا ناردووە کە مزگێنیش بدەیی و بیشیان ترسێنی، دەربارەی دۆزەخیانیش بەرپرس نیت. واتە ئەی موحەممەد(ﷺ)! تۆ دەربارەی ئەو خوانەناسانە پرسیارت لێناکرێ کە بڕوایان پێنەهێناوی، وەك ئەم ئایاتانەش کە ئەفەرموێت: ﴿فَإِنَّمَا عَلَيْكَ ٱلْبَلَٰغُ وَعَلَيْنَا ٱلْحِسَابُ﴾[2] تۆ هەر ئەوەندەت لەسەرە ڕایگەیەنی و لێپرسینەوەشی لەسەر ئێمەیە. وە ئەفەرموێت: ﴿فَذَكِّرْ إِنَّمَآ أَنتَ مُذَكِّرٌ ﴿٢١﴾ لَّسْتَ عَلَيْهِم بِمُصَيْطِرٍ﴾[3] ساتۆ ئامۆژگاری بکە، تۆ تەنیا ئامۆژگاری کەری، تۆ لەسەریان نەبویتە خاوەن دەسەڵات. وە ئەفەرموێت: ﴿نَّحْنُ أَعْلَمُ بِمَا يَقُولُونَ ۖ وَمَآ أَنتَ عَلَيْهِم بِجَبَّارٍ ۖ فَذَكِّرْ بِٱلْقُرْءَانِ مَن يَخَافُ وَعِيدِ﴾[4] واتە: بێگومان ئێمە ئاگادارین بەوەی کە دەیڵێین تۆ دەسەڵاتت بەسەریاندا نیە کەوایە تۆ بەم قورئانە ئامۆژگاری ئەو کەسە بکە کە لە هەڕەشەی من دەترسێ.

**سیفەتەکانی پێغەمبەر (ﷺ) لە تەوراتدا**

ئیمامی ئەحمەد ڕیوایەتی کردووە لە عەتای کوڕی یەسارەوە ئەڵێت: گەیشتم بە عەبدڵڵای کوڕی عەمری کوڕی عاس پێم وت: باسی سیفەتی پێغەمبەری خودام (ﷺ) بۆبکە لە تەوڕتدا، ئەویش وتی:

---

[1] یونس ٩٦-٩٧.

[2] الرعد ٤٠.

[3] الغاشية ٢١-٢٢.

[4] ق ٤٥.

بڵێ سوێند بە خودا وەسف کراوە لە تەوراتدا بەو شێوەیەی کە لە قورئاندا وەسف کراوە، ئەی پێغەمبەر(ﷺ)! ئێمە تۆمان ڕەوان کردووە بە نیشانە و مزگێنی دەرو ترسێنەرو پەناو داڵدە بۆ عەرەبە نەخوێندەوارەکان. تۆ بەندە و ڕەوانکراوی منی. ناوی موتەوەکیلم لێ نای. دڵ ڕەق و توند و تیژ و دەنگ بەرز کەرەوە نیە لە بازاڕەکاندا، خراپە بە خراپە وەڵام ناداتەوە، لێبوردەو چاوپۆشی کەرە. وەری ناگرێتەوە ونای مرێنێ تا ئەو نەتەوە خوارو خێچەی پێڕاست دەکاتەوە کە بڵێن: (لاإله إلا الله) چاوە کوێرەکان و گوێ کەڕەکان و دڵە داخراوەکانی پێدەکاتەوە[1]. تەنیا بوخاری هێناویەتی لە باسی کڕین و فرۆشتن و تەفسیردا ڕیوایەتی کردووە[2].

﴿وَلَن تَرْضَىٰ عَنكَ ٱلْيَهُودُ وَلَا ٱلنَّصَٰرَىٰ حَتَّىٰ تَتَّبِعَ مِلَّتَهُمْ ۗ قُلْ إِنَّ هُدَى ٱللَّهِ هُوَ ٱلْهُدَىٰ ۗ وَلَئِنِ ٱتَّبَعْتَ أَهْوَآءَهُم بَعْدَ ٱلَّذِى جَآءَكَ مِنَ ٱلْعِلْمِ ۙ مَا لَكَ مِنَ ٱللَّهِ مِن وَلِىٍّ وَلَا نَصِيرٍ ﴿١٢٠﴾ ٱلَّذِينَ ءَاتَيْنَٰهُمُ ٱلْكِتَٰبَ يَتْلُونَهُۥ حَقَّ تِلَاوَتِهِۦٓ أُو۟لَٰٓئِكَ يُؤْمِنُونَ بِهِۦ ۗ وَمَن يَكْفُرْ بِهِۦ فَأُو۟لَٰٓئِكَ هُمُ ٱلْخَٰسِرُونَ ﴿١٢١﴾﴾

### گاورو جوولەکە لێتان ڕازی نابن هەتا نەچنە سەر دینی ئەوان

خودای گەورە ئەفەرموێت: ﴿وَلَن تَرْضَىٰ عَنكَ ٱلْيَهُودُ وَلَا ٱلنَّصَٰرَىٰ حَتَّىٰ تَتَّبِعَ مِلَّتَهُمْ ۗ قُلْ إِنَّ هُدَى ٱللَّهِ هُوَ ٱلْهُدَىٰ ۗ وَلَئِنِ ٱتَّبَعْتَ أَهْوَآءَهُم بَعْدَ ٱلَّذِى جَآءَكَ مِنَ ٱلْعِلْمِ ۙ مَا لَكَ مِنَ ٱللَّهِ مِن وَلِىٍّ وَلَا نَصِيرٍ﴾ ئەم جوولەکە و فەلانە تا نەچیتە سەر دینی ئەوان، هەرگیز لە تۆ ڕازی نابن، بڵێ: ڕێی ڕاست هەر ڕێی خودایە، ئەگەر تۆ پاش ئەو زانستەی بۆت هاتووە، شوێن ئارەزوی ئەوان کەوی، ئیتر خودا دۆستایەتیت ناکا و نایاتە یارمەتیتەوە. ئیبنو جەریرئەڵێت: خودای مەزن مەبەستی بەم ئایەتە ئەوەیە کە ئەی موحەمەد(ﷺ)! هەرگیز گاورو جوولەکە لێت ڕازی نابن، واز لەو داخوازیانەیان بێنە کە لەگەڵ خواست و ئارەزوی ئەواندایە، بەرەو ڕەزامەندی خودا بڕۆ بانگیان بکە بۆ ئەو هەقەی کە خودا ڕەوانەی کردووی بۆی ﴿قُلْ إِنَّ هُدَى ٱللَّهِ هُوَ ٱلْهُدَىٰ ۗ عَلَيْكُمْ﴾ بڵێ: ڕێی ڕاست هەر ڕێی خودایە. واتە: هەر ئەوە ئاینی ڕاست و ڕوانە[3]. واتە: ئاینی تێرو تەواو ڕاست و ڕەوانە. قەتادە ئەڵێت: لەم دەقەدا کە خودای مەزن ئەفەرموێت: ﴿قُلْ إِنَّ هُدَى ٱللَّهِ هُوَ ٱلْهُدَىٰ ۗ عَلَيْكُمْ﴾ بڵێ: ڕێی ڕاست هەر ڕێی خودایە، ئەڵێت: دژایەتیەک بوو خودا موحەمەدو(ﷺ)

---

[1] أحمد /٢/١٧٤ سە حيحە ص٩٦.

[2] فتح البارى/٤/٤٠٢/٨/٤٤٩، والاب والمفرد/٧٢.

[3] الطبرى /٢/٥٦٢.

هاوەڵەکانی فێر کرد کە دژایەتی خەڵکی گومڕای پێبکەن[1]. دیسان قەتادە ئەڵێت: پێمان گەیشتووە کە پێغەمبەری خودا(ﷺ) فەرموویەتی: بەردەوام تاقمێك لە ئومەتەکەم لەسەر هەق دەجەنگن و نابەزن، کەسێ بیوێ دژایەتیان بکا ناتوانێ زیانیان لێ بدات، تا فەرمانی خودا دێت[2]. منیش دەڵێم: ئەم فەرموودە لە عەبدڵلای کوڕی عەمرەوە ڕیوایەت کراوە لە سەحیحی موسلیمدا هاتووە[3]. پاشان خودای مەزن ئەفەرموێت: ﴿وَلَئِنِ اتَّبَعْتَ أَهْوَاءَهُم بَعْدَ الَّذِي جَاءَكَ مِنَ الْعِلْمِ مَا لَكَ مِنَ اللَّهِ مِن وَلِيٍّ وَلَا نَصِيرٍ﴾ ئەگەر تۆ پاش ئەو زانستەی بۆت هاتووە، شوێن ئارەزوی ئەوان کەوی ئیتر خودا دۆستایەتیت ناکاو نایەتە یارمەتیتەوە. ئەمە هەڕەشەی توندی تێدایە بۆ ئەم ئومەتە دەربارەی شوێن کەوتنی ڕێبازی گاورو جولەکە دوای ئەوەی کە شارەزای قورئان و سونەت بوون. پەنا بە خوا لەوە ڕوی وتارەکە لەگەڵ پێغەمبەری خودایە(ﷺ) بەڵام فەرمانەکە بۆ ئومەتەکەیەتی.

### مانای خوێندنەوەی ڕاست

خودای گەورە ئەفەرموێت: ﴿الَّذِينَ آتَيْنَاهُمُ الْكِتَابَ يَتْلُونَهُ حَقَّ تِلَاوَتِهِ﴾ ئەو کەسانەی کە کتێبمان پێداون و وەك پێویست دەیخوێننەوە دیارە بڕوایان پێی هەیە. عەبدورەزاق ئەڵێت: لە موعەمەرەوە لە قەتادەوە ئەڵێت: ئەوانە گاورو جوولەکەن. ئەمە قسەی عەبدورحمانی کوڕی زەیدی کوڕی ئەسلەمەیشە، ئیبنو جەریریش هەر ئەم ڕیوایەتەی هەڵبژاردووە. سەعید لە قەتادەوە ئەڵێت: ئەوانە هاوەڵەکانی پێغەمبەری خودان(ﷺ). ئەبولعالیە لە ئیبنو مەسعودەوە ئەڵێت: سوێند بەو کەسەی گیانی منی بەدەستە بەڕاستی خوێندنەوە ئەوەیە کە حەلاڵ بە حەلاڵ بزانرێ و حەرامیش بە حەرام بزانرێ و بەو شێوەش بخوێنرێتەوە کە خودا ناردویەتیە خوارەوە، وتەکانی لە شوێنی خۆی نەگۆڕێ هیچ شتێکی لێ تەئویل نەکرێ کە تەئویلەکەی لە جێگەی خۆی نەبێ[4]. سوددی ئەڵێت؛ لە ئەبو مالیکەوە لە ئیبنو عەباسەوە لەم ئایەتەدا ئەڵێت: حەڵاڵەکانی بە حەلاڵ دەزانن و حەرامەکانی بە حەرام دەزانن و لە شوێنی خۆیدا نایگۆڕن[5]. وە لە عومەری کوڕی خەتابەوە ئەڵێت: ئەوکەسانەن کە تێپەڕین بەلای ئایەتی بەزەییدا داوای بەزەیی لە خوا دەکەن، وە کاتێ تێپەڕین بە لای ئایەتی سزادا پەنا دەگرن بە خودا لێی[6]. ئەڵێت: وە ئەم مانایە ڕیوایەت کراوە لە پێغەمبەرەوە(ﷺ) کاتێ کە

---

[1] ابن ابی حاتم /١/٣٥٦.

[2] ابن ابی حاتم /١/٣٥٥.

[3] مسلم /١٩٢٤.

[4] الطبری /٢/٥٦٧ ص٩٦.

[5] الطبری /٢/٥٦٧.

[6] القرطبی /٢/٩٥.

تێپەڕی بێ بەلای ئایەتی بەزەیدا داوای بەزەیی کردووە، وە کاتێ تێپەڕیبێ بەلای ئایەتی سزادا پەنای گرتووە بە خودا[1]. وە ئەفەرموێت: ﴿أُوْلَٰٓئِكَ يُؤْمِنُونَ بِهِۦ﴾ ئەوانە بڕوایان پێی هەیە. خەبەرە لە: ﴿ٱلَّذِينَ ءَاتَيْنَٰهُمُ ٱلْكِتَٰبَ يَتْلُونَهُۥ حَقَّ تِلَاوَتِهِۦٓ﴾ ئەوانەی کتێبمان پێداون و وەك پێویست دەیخوێننەوە. واتە: هەرکەسێ کاری بەو کتێبەی کە هاتۆتە خوارەوە بۆ پێغەمبەرە پێشوەکان کردبێ بە ڕاستی لە ئەهلی کتێب بڕواشی هێنابێ بەوەی کە تۆم پێدا ڕەوانەکردووە ئەی موحەممەد(ﷺ) وەك خودای گەورە لە ئایەتێکی ترا ئەفەرموێت: ﴿وَلَوْ أَنَّهُمْ أَقَامُواْ ٱلتَّوْرَىٰةَ وَٱلْإِنجِيلَ وَمَآ أُنزِلَ إِلَيْهِم مِّن رَّبِّهِمْ لَأَكَلُواْ مِن فَوْقِهِمْ وَمِن تَحْتِ أَرْجُلِهِم﴾[2] ئەگەر ئەوان تەورات و ئینجیل و ئەوەی لە پەروەردگاریانەوە بۆیان هاتووە تەواوکاریان پێبکردایە، بێگومان لەلای سەریانەوەو لە زەمینی ژێر پێکانیانەوە خواردنیان بۆ دابین ئەکرا. وە ئەفەرموێت: ﴿قُلْ يَٰٓأَهْلَ ٱلْكِتَٰبِ لَسْتُمْ عَلَىٰ شَىْءٍ حَتَّىٰ تُقِيمُواْ ٱلتَّوْرَىٰةَ وَٱلْإِنجِيلَ وَمَآ أُنزِلَ إِلَيْكُم مِّن رَّبِّكُمْ﴾[3] بڵێ: ئەی ئەهلی کتێب! ئێوە تابەپێی تەورات و ئینجیل و هەرچی لە پەروەردگارتانەوە بۆتان هاتۆتە خوارەوە نەجوڵێنەوە ئێوە لەسەر هیچ نین. واتە: ئەگەر بەڕاستی کاریان پێبکەن و باوەڕتان پێیان ببێ و ئەو هەواڵانەی کە تیایاندا هاتووە بە ڕاستان زانی دەربارەی ڕەوانەکردنی موحەممەد(ﷺ) ڕەوشت و سیفەتەکانی و فەرمان دان بە شوێن کەوتنی و یارمەتی دان و پشتگیری لێکردنی، ئەوە پاڵتان پێوە دەنێ بۆ شوێنکەوتنی چاکە لە دونیا و لە قیامەتا. وەك خودای مەزن ئەفەرموێت: ﴿ٱلَّذِينَ يَتَّبِعُونَ ٱلرَّسُولَ ٱلنَّبِىَّ ٱلْأُمِّىَّ ٱلَّذِى يَجِدُونَهُۥ مَكْتُوبًا عِندَهُمْ فِى ٱلتَّوْرَىٰةِ وَٱلْإِنجِيلِ﴾[4] ئەوانەی وا دەکەونە شوێن ئەو پێغەمبەرەی کە ڕاسپاردەی خودایە و نەخوێندەوارە و لە تەورات و ئینجیلیش ناوی نوسراوە. وە ئەفەرموێت: ﴿قُلْ ءَامِنُواْ بِهِۦٓ أَوْ لَا تُؤْمِنُوٓاْ إِنَّ ٱلَّذِينَ أُوتُواْ ٱلْعِلْمَ مِن قَبْلِهِۦٓ إِذَا يُتْلَىٰ عَلَيْهِمْ يَخِرُّونَ لِلْأَذْقَانِ سُجَّدًا (١٠٧) وَيَقُولُونَ سُبْحَٰنَ رَبِّنَآ إِن كَانَ وَعْدُ رَبِّنَا لَمَفْعُولًا﴾[5] بڵێ: ئێوە بڕواتان پێ بێ یان نەبێ، ئەو کەسانەی لە پێشوودا لەمە ئاگادار بوون، هەرکاتێ بۆیان دەخوێنندەوە چەناکە دەخەنە سەرزەوی وسوژدە دەبەن. ئەشڵێن: پاکی بۆ پەروەردگاری ئێمەیە، بەڵێنی پەروەردگارمان وا

---

[1] ابن ماجة /٤٢٩.

[2] المائدة ٦٦.

[3] المائدة ٦٨.

[4] الاعراف ١٥٧.

[5] الاسراء ١٠٧-١٠٨.

وەدی هات. واتە: بەڵێنی ئێمە دەربارەی موحەممەد (ﷺ) وا هاتۆتە دی. وە خودای گەورە ئەفەرموێت: ﴿ ٱلَّذِينَ ءَاتَيۡنَٰهُمُ ٱلۡكِتَٰبَ مِن قَبۡلِهِۦ هُم بِهِۦ يُؤۡمِنُونَ ۝٥٢ وَإِذَا يُتۡلَىٰ عَلَيۡهِمۡ قَالُوٓاْ ءَامَنَّا بِهِۦٓ إِنَّهُ ٱلۡحَقُّ مِن رَّبِّنَآ إِنَّا كُنَّا مِن قَبۡلِهِۦ مُسۡلِمِينَ ۝٥٣ أُوْلَٰٓئِكَ يُؤۡتَوۡنَ أَجۡرَهُم مَّرَّتَيۡنِ بِمَا صَبَرُواْ وَيَدۡرَءُونَ بِٱلۡحَسَنَةِ ٱلسَّيِّئَةَ وَمِمَّا رَزَقۡنَٰهُمۡ يُنفِقُونَ ﴾[1] ئەو کەسانەی کە لە پێش هاتنی قورئان، ئێمە کتێبمان پێداون باوەڕیان بە قورئان هەیە. کاتێ کە بۆیان دەخوێننەوە دەڵێن: بڕوامان پێهێناوەو بێگومان ڕاستە و لە پەروەردگاریانەوەیە، بەر لەوەش بێتە خوارەوە ئێمە قبوڵمان کردبوو. ئەوانە چوون خۆڕاگر بوون، دوو جار پاداشتیان پێئەدرێت. کاری خراپیش بە چاکە دەسڕنەوەو لەو بژێویەی پێمان داون چاکە دەکەن. وە ئەفەرموێت: ﴿وَقُل لِّلَّذِينَ أُوتُواْ ٱلۡكِتَٰبَ وَٱلۡأُمِّيِّـۧنَ ءَأَسۡلَمۡتُمۡۚ فَإِنۡ أَسۡلَمُواْ فَقَدِ ٱهۡتَدَواْۖ وَّإِن تَوَلَّوۡاْ فَإِنَّمَا عَلَيۡكَ ٱلۡبَلَٰغُۗ وَٱللَّهُ بَصِيرُۢ بِٱلۡعِبَادِ ﴾[2] بەو کەسانەش کە بوونەتە ئەهلی کتێب و بەو کەسانەش کە نەزانن بڵێ: ئایا ئێوەش وەکو ئێمە خۆتان هەر بە خودا سپاردووە؟ جائەگەر خۆیان سپاردبوو، ئەوا کەوتونەتە سەر ڕێگا، ئەگەر ڕویان لێوەرگێڕای، تۆ هەر ئەوەندەت لەسەرە ڕای بگەیەنی خودایش بۆخۆی شارەزای بەندەکانیەتی. هەر بۆیە لێرەدا ئەفەرموێت: ﴿وَمَن يَكۡفُرۡ بِهِۦ فَأُوْلَٰٓئِكَ هُمُ ٱلۡخَٰسِرُونَ﴾ ئەوانەش بڕوای پێنەکەن لە ڕیزی زیان بارانن. وەك خودای گەورە لە ئایەتێکی تریشدا ئەفەرموێت: ﴿وَمَن يَكۡفُرۡ بِهِۦ مِنَ ٱلۡأَحۡزَابِ فَٱلنَّارُ مَوۡعِدُهُۥ ﴾[3] هەرکەسیش لەو کۆمەڵانە بڕوایان پێی نەبێ جێی لە ئاگر ئامادە کراوە. وە لە فەرمودەی سەحیحا هاتووە: سوێند بەو کەسەی گیانی منی بەدەستە، هیچ کەسێ نیە هەواڵی من ببیستێ لەم ئومەتە جوولەکە بێ یان گاور پاشان بڕوای بە من نەبێت مەگین چۆتە ناو ئاگر[4].

﴿يَٰبَنِيٓ إِسۡرَٰٓءِيلَ ٱذۡكُرُواْ نِعۡمَتِيَ ٱلَّتِيٓ أَنۡعَمۡتُ عَلَيۡكُمۡ وَأَنِّي فَضَّلۡتُكُمۡ عَلَى ٱلۡعَٰلَمِينَ ۝١٢٢ وَٱتَّقُواْ يَوۡمٗا لَّا تَجۡزِي نَفۡسٌ عَن نَّفۡسٖ شَيۡـٔٗا وَلَا يُقۡبَلُ مِنۡهَا عَدۡلٞ وَلَا تَنفَعُهَا شَفَٰعَةٞ وَلَا هُمۡ يُنصَرُونَ ۝١٢٣﴾

### خودای مەزن بەهرەکانی خۆی دێنێتەوە بەر چاوی نەوەی ئیسرائیل

خودای گەورە ئەفەرموێت: ﴿يَٰبَنِيٓ إِسۡرَٰٓءِيلَ ٱذۡكُرُواْ نِعۡمَتِيَ ٱلَّتِيٓ أَنۡعَمۡتُ عَلَيۡكُمۡ وَأَنِّي فَضَّلۡتُكُمۡ عَلَى ٱلۡعَٰلَمِينَ ۝١٢٢ وَٱتَّقُواْ يَوۡمٗا لَّا تَجۡزِي نَفۡسٌ عَن نَّفۡسٖ شَيۡـٔٗا وَلَا يُقۡبَلُ مِنۡهَا عَدۡلٞ وَلَا تَنفَعُهَا شَفَٰعَةٞ وَلَا هُمۡ يُنصَرُونَ﴾ ئەی نەوەی

---

[1] القصص ٥٢-٥٤.

[2] ال عمران ٢٠.

[3] هود ١٧.

[4] مسلم /١/١٣٤ ص٩٧.

ئیسرائیل! لەبیر مەکەن چەندە چاکەم لەگەڵ کردوون لەچاو خەڵکی هەموو دونیادا زیاتر ڕێزم لە ئێوە نا. دەبێ بترسن لەو ڕۆژەی کە کەس لە بری کەس تۆڵە و پاداشت نادرێتەوە، کڕینەوە لەو ڕۆژەدا باوی نیە و تکاکاری بەهرە نادا و کەسیش بە هانای کەس نایە. وێنەی ئەم ئایەتە لە سەرەتای ئەم سورەتەدا تەفسیر کراوە و لێرەدا دووبارە کراوەتەوە، جەخت دەکاتەوە لەسەر شوێن کەوتنی ئەم پێغەمبەرە نەخوێندەوارە کە سیفەتەکانی لە کتێبەکانیادا دەبینن، ناوی خۆیی و ڕەوشتی و فەرمانی و ئومەتەکەی تێدایە. خودای مەزن هەڕەشەی لێکردوون ئەوە بشارنەوە، ئەو بەهرانەش دەرنەخەن کە خودا پێی بەخشیون و فەرمانە پێداون ئەو بەهرانە لە بیر نەکەن چ بەهرەی دنیایی یان دینی، وە ئیرەیی نەبەن بە نەوەی مامەکانیان لە عەرەبەکان کە خودا چاکەی لەگەڵ کردوون و دوایین پێغەمبەری لەناویاندا ڕەوانە کردووە، ئەو ئیرەییە وایان لێنەکا دژایەتی بکەن و بڕوای پێنەهێنن، بەردەوام لە پەیڕەوی ئەو لادەن تا ڕۆژی قیامەت.

﴿ ۞ وَإِذِ ٱبۡتَلَىٰٓ إِبۡرَٰهِـۧمَ رَبُّهُۥ بِكَلِمَٰتٖ فَأَتَمَّهُنَّۖ قَالَ إِنِّي جَاعِلُكَ لِلنَّاسِ إِمَامٗاۖ قَالَ وَمِن ذُرِّيَّتِيۖ قَالَ لَا يَنَالُ عَهۡدِي ٱلظَّٰلِمِينَ (١٢٤) ﴾

## باسی ئیبراهیمی خەلیل و کردنی بە ڕێبەری خەڵکی لە دونیا

خودای گەورە ئەفەرموێت: ﴿وَإِذِ ٱبۡتَلَىٰٓ إِبۡرَٰهِـۧمَ رَبُّهُۥ بِكَلِمَٰتٖ فَأَتَمَّهُنَّۖ قَالَ إِنِّي جَاعِلُكَ لِلنَّاسِ إِمَامٗاۖ قَالَ وَمِن ذُرِّيَّتِيۖ قَالَ لَا يَنَالُ عَهۡدِي ٱلظَّٰلِمِينَ ﴾ کاتێ خودا بەچەند وشە ئیبراهیمی تاقی کردوە، ئەویش بەجێی هێنان، وتی: دەتکەم بە ڕێبەری خەڵکی دونیا. وتی: ئایا لە نەوەکانیشم؟ فەرمووی: ستەمکاران وەبەر بەڵێنم ناکەون. خودای گەورە باسی ڕێزو قەدری ئیبراهیم دەکا سەلامی خوای لێبێ کە کردویەتی بە ڕێبەری خەڵکی کە چاو لەئەو بکەن لە یەکتا پەرستیدا، کاتێ کە ئەرکی فەرمان بەچاکە و بەرگری لە خراپەی خستە سەر شانی، هەر بۆیە خودای گەورە ئەفەرموێت: ﴿وَإِذِ ٱبۡتَلَىٰٓ إِبۡرَٰهِـۧمَ رَبُّهُۥ بِكَلِمَٰتٖ﴾ کاتێ خودا بەچەند وشە ئیبراهیمی تاقی کردەوە. واتە: ئەی موحەمەد(ﷺ)! وە بیری ئەو بتپەرست و ئەهلی کتێبانەی بێنەرەوە، کە خۆیان بە شوێن کەوتووی ئیبراهیم دادەنێن، بەڵام شوێن کەوتوی ئەو نین، بێگومان ئەوەی لەسەر پەیڕەوی ئەوەو ڕێك و ڕاستە، تۆو ئەوانەن لە خاوەنباوەڕان کەلەگەڵ تۆن، باسی ئەو تاقی کردنەوەی ئیبراهیم بکە بۆیان کە خودای مەزن کردی و فەرمان با چاکە و برگری لە خراپەی خستە ئەستۆی: ﴿فَأَتَمَّهُنَّۖ﴾ئەویش بەتەواوی بەجێی هێنان. وەك خودای گەورە ئەفەرموێت: ﴿ وَإِبۡرَٰهِيمَ ٱلَّذِي وَفَّىٰٓ ﴾[1] یان ئیبراهیم کە ئەرکی خۆی بەتەواوی بەجێ هێنا؟ واتە: لە هەموو ئەوانەدا

---

[1] النجم ٣٧.

کە خودا کردبووی بە ئەرکی و پێی سپاردبوو بەجێی هێنا. خودای گەورە ئەفەرموێت: ﴿ إِنَّ إِبْرَٰهِيمَ كَانَ أُمَّةً قَانِتًا لِّلَّهِ حَنِيفًا وَلَمْ يَكُ مِنَ ٱلْمُشْرِكِينَ ﴿١٢٠﴾ شَاكِرًا لِّأَنْعُمِهِ ٱجْتَبَٰهُ وَهَدَىٰهُ إِلَىٰ صِرَٰطٍ مُّسْتَقِيمٍ ﴿١٢١﴾ وَءَاتَيْنَٰهُ فِى ٱلدُّنْيَا حَسَنَةً وَإِنَّهُۥ فِى ٱلْءَاخِرَةِ لَمِنَ ٱلصَّٰلِحِينَ ﴿١٢٢﴾ ثُمَّ أَوْحَيْنَآ إِلَيْكَ أَنِ ٱتَّبِعْ مِلَّةَ إِبْرَٰهِيمَ حَنِيفًا وَمَا كَانَ مِنَ ٱلْمُشْرِكِينَ ﴾[1] ئیبراهیم پێشەوایەکی بەرەو هەق چوو بووە بەرفەرمانی خودا بوو، لە ڕیزی ئەوانە نەبوو شەریك بۆ خودا دادەنێن، چاکەی خودای لەبەر چاو بوو، خودایش بۆخۆی هەڵی بژاردو شارەزای ڕێگەی ڕاستی کرد، لە دنیا بەهرەمان دایە و لە ڕۆژی قیامەتیشا لە ڕیزی چاکاندایە، پاشان بە تۆمان ڕاگەیاند کە: پەیڕەوی ئایینی ئیبراهیمی بەهەق چووبە، ئەو لەگەڵ ئەوانە نەبوو کە شەریك بۆ خودا دادەنێن. وە ئەفەرموێت: ﴿قُلْ إِنَّنِى هَدَىٰنِى رَبِّىٓ إِلَىٰ صِرَٰطٍ مُّسْتَقِيمٍ دِينًا قِيَمًا مِّلَّةَ إِبْرَٰهِيمَ حَنِيفًا وَمَا كَانَ مِنَ ٱلْمُشْرِكِينَ ﴾[2] تۆ بڵێ: پەروەردگاری من خستومیە سەر ڕاستە ڕێگە، سەر دینێ کەپایەدارە، دینی ئەو ئیبراهیمە وا لەناهەق لای داوەو هەرگیز هیچ شەریکێکی بۆ خودا بڕیار نەداوە. وە ئەفەرموێت: ﴿ مَا كَانَ إِبْرَٰهِيمُ يَهُودِيًّا وَلَا نَصْرَانِيًّا وَلَٰكِن كَانَ حَنِيفًا مُّسْلِمًا وَمَا كَانَ مِنَ ٱلْمُشْرِكِينَ ﴿٦٧﴾ إِنَّ أَوْلَى ٱلنَّاسِ بِإِبْرَٰهِيمَ لَلَّذِينَ ٱتَّبَعُوهُ وَهَٰذَا ٱلنَّبِىُّ وَٱلَّذِينَ ءَامَنُوا۟ وَٱللَّهُ وَلِىُّ ٱلْمُؤْمِنِينَ ﴾[3] ئیبراهیم نە مووسایی بو نە مەسیحیی، بەلام یەکتا پەرستێك بوو خۆی بە خودا سپاردبوو، هیچ هاوکاری بۆ خودا پەیدا نەدەکرد، ئەو کەسانەی لە هەموو کەس لە ئیبراهیم نزیکترن، ئەوانەن کە ئەوسا شوێن ئەو کەوتن و ئەم پێغەمبەرەو ئەوانە کە بڕوایان پێهێناوە، خودایش دۆستی خاوەن باوەڕانە. خودای گەورە ئەفەرموێت: ﴿بِكَلِمَٰتٍ﴾ یانی: بەبەرنامەکانی خوداو فەرمانەکانی و قەدەغە کراوەکانی چونکە وشەی (الكلمات) بەکار دەهێنرێ مەبەست پێی کەلیماتی قەدەریە وەك خودای مەزن دەربارەی مریەم ئەفەرموێت: ﴿وَصَدَّقَتْ بِكَلِمَٰتِ رَبِّهَا وَكُتُبِهِۦ وَكَانَتْ مِنَ ٱلْقَٰنِتِينَ ﴾[4] بە وتارو کتێبانی پەروەردگاری بڕوای هێناو لە ڕیزی فەرمان بەران بوو. وە بەکار دەهێنرێ مەبەست پێی کەلیماتی شەرعیەوەك خودای مەزن ئەفەرموێت: ﴿ وَتَمَّتْ

---

[1] النحل ١٢٠–١٢٣.

[2] الانعام /١٦١.

[3] ال عمران ٦٧–٦٨.

[4] التحريم ١٢.

﴿كَلِمَتُ رَبِّكَ صِدْقًا وَعَدْلًا﴾[1] قسەكانی پەروەردگارت لەبێ لایەنگری و ڕاستیدا تەواو بێ کەم و کوڕین. یانی: قسە شەرعیەکانی، کە یان هەواڵێکی ڕاستە یان داوای دادوەریە ئەگەر فەرمان بوو یان ڕێگری. لەم جۆرە ئەم ئایەتە پیرۆزەیە کە خودای مەزن ئەفەرموێت: ﴿وَإِذِ ابْتَلَىٰ إِبْرَاهِيمَ رَبُّهُ بِكَلِمَاتٍ فَأَتَمَّهُنَّ﴾ کاتێ خودا بەچەند وشە ئیبراهیمی تاقی کردەوە، ئەویش بەجێی هێنا. وە فەرموی: ﴿قَالَ إِنِّي جَاعِلُكَ لِلنَّاسِ إِمَامًا﴾ فەرموی دەتکەم بە ڕێبەری خەڵکی دونیا. واتە: لەپاداشتی ئەو کارانەی کە بەجێی هێنا لە فەرمان کردن بەچاکە و وازهێنان لە خراپە، خودای مەزن کردیە ڕێبەری خەڵکی، کەچاوی لێبکرێ و ڕێڕەوی ئەو بگرنە بەر.

### وشەکانی تاقی کردنەوە کامانەن؟

ڕای جیاواز هەیە لەسەر دیاری کردنی ئەو وشانە کە خودای مەزن ئیبراهیمی خەلیلی سەلامی خوای لێبێ پێ تاقی کردەوە. چەندین ڕیوایەت کراوە لە ئیبنو عەباسەوە لەو بارەیەوە ئەڵێت: خودا بە دروشمەکانی تاقی کردەوە[2]. ئەبو ئیسحاقیش هەر وا ڕیوایەتی کردووە[3]. دیسان عەبدورەزاق ڕیوایەتی کردوە لە ئیبنو عەباسەوە: ﴿وَإِذِ ابْتَلَىٰ إِبْرَاهِيمَ رَبُّهُ بِكَلِمَاتٍ﴾ کاتێ خودا بەچەند وشەیەك ئیبراهیمی تاقی کردەوە. وتی: بە پاك و خاوێنی تاقی کردەوە، پێنجیان لەسەر دا، پێنجی کەشیان لە لاشەدا، لەسەردا کورت کردنەوەی سمێڵ و ئاو لە لووت وەردان و سیواك کردن و سەرداهێنان وە لەلاشەدا نینۆك کردن و بەرتاشین و خەتەنە کردن، موی بن باڵ لابردن[4]. وە شۆردنی شوێنی پیسی و میز بە ئاو. ئیبنو ئەبی حاتەم ئەڵێت: ڕیوایەت کراوە لە سەعیدی کوڕی موسەیەب و موجاهید و شەعبی و نەخەعی و ئەبو ساڵح و ئەبو جەلدەوە هەر بەو جۆرە[5]. منیش دەڵێم هەر بەو جۆرە لە سەحیحی موسلیمدا هاتووە لە عائیشەوە ڕەزای خوای لێبێ وتی: پێغەمبەری خودا(ﷺ) فەرمویەتی: دە شت لە فیترەتن: کورت کردنەوەی سمێڵ، هێشتنەوەی ڕیش، سیواك کردن، ئاو لە لوت وەردان، نینۆك کردن، شۆردنی جومگەی پەنجەکان، موی بنباڵ لابردن، بەرتاشین، تارەت گرتن. مەسعەب ئەڵێت: دەیەمم لە بیر چوەوە، مەگین ئاو لەدەم بەردان بوو. وەکیع ئەڵێت: (إنتقاص الما) یانی: تارەت گرتن[6]. وە لە

---

[1] الانعام ١١٥.

[2] الطبری /٣/١٣ ص٩٨.

[3] الطبری /٣/١٣.

[4] عبد الرزاق /١/٥٧.

[5] ابن ابی حاتم /١/٣٥٩.

[6] مسلم /١/٢٢٣ ص٩٨.

هەر دوو سەحیحەکەدا هاتووە لە ئەبو هورەیرەوە لە پێغەمبەری خوداوە(ﷺ): پێنج شت لە سروشتی پاکە: خەتەنە کردن، بەرتاشین، کورتکردنەوەی سمێڵ، نینۆك کردن، توکی بن باڵ لابردن[1]. وتەکە هی موسلیمە. موحەمەدی کوڕی ئیسحاق ڕیوایەتی کردووە لە ئیبنو عەباسەوە ئەڵێت: ئەو وشانەی خودا ئیبراهیمی پێتاقی کردەوە، بەتەواوی بەجێی هێنان، دابڕانی لە هۆزەکەی خۆی لەبەر ڕەزامەندی خوا بوو کاتێ کە فەرمانی پێدا کە لێیان جیا ببێتەوە، ڕووبەڕووبونەوەی نەمرودلەبەر ڕەزای خودا کاتێ کەوەستاندی و ڕێی پێنەدا لەسەر ئەو مەترسیەی کە کێشەی هەبوو لەگەڵی، خۆڕاگری لەسەر خستنی ناو ئاگر تا لەبەر ڕەزامەندی خوا بیسوتێنن، لەسەر خراپی ئەو کارەی ئەوان لەسەری بوون، کۆچ کردنی لەدوای ئەوە لە زێدی خۆی لەبەر ڕەزای خودا، کاتێ پێیان وت: لێیان دوورکەوێتەوەو بڕوا. وە ئەو فەرمانەی خودایش پێی کە ڕێز لە میوان بگرێ و خۆڕاگر بێ لەسەری بە خۆیی و ماڵ و سامانیەوە، وە ئەو تاقی کردنەوەش کە توشی هات لەسەر بڕینی کوڕەکەی، کاتێ کە خودا فەرمانی پێدا کەسەری ببڕێ. کاتێ کە ئیبراهیم هەڵسا بەو کارانە بەتەواوی، دڵسۆزی خۆی دەربڕی بەرامبەر ئەو تاقی کردنەوانە، خودای مەزن پێی فەرموو﴿أَسْلِمْ قَالَ أَسْلَمْتُ لِرَبِّ ٱلْعَٰلَمِينَ﴾[2] وەرە خۆت بەمن بسپێرە، وتی: وا خۆم دایە دەستی ڕاهێنەری هەموو دونیا. لەسەر ئەو شتانە خەڵکی لەسەری ناکۆك بوون و لێی لائەدەن[3].

## ستەمکاران بەر بەڵێنی خودا ناکەون

خودای گەورە ئەفەرموێت: ﴿وَمِن ذُرِّيَّتِي﴾ ئەی نەوەکەم؟ ﴿لَا يَنَالُ عَهْدِي ٱلظَّٰلِمِينَ﴾ فەرمووی: ستەم کاران بەر بەڵێنی من ناکەون. کاتێ کە خودای مەزن ئیبراهیمی کردە پێشەوا، داوای کرد لە خودا کە پێشەوای لەدوای خۆی لەنەوەکانیا بهێڵێتەوە، وەڵامی بۆ ئەوە درایەوە، ئاگادار پەیدا دەبێ کە لەناو نەوەی ستەمکار پەیدا دەبێ، ئەو بەڵێنەی خودا ئەوانە ناگرێتەوە و نابنە پێشەواو کەس پەیڕەویان ناکا. بەڵگەش لەسەر ئەوە کە وڵامی داواکەی دراوەتەوە خودای مەزن لە سوورەتی عەنکەبوتا ئەفەرموێت: ﴿وَجَعَلْنَا فِي ذُرِّيَّتِهِ ٱلنُّبُوَّةَ وَٱلْكِتَٰبَ﴾[4] پێغەمبەرێتی و کتێبیشمان کردە بەشی نەتەوەی ئەو. هەر پێغەمبەرێ خودا ڕەوانەی کردبێ و هەر کتێبێ خودا ناردبێتیە خوارەوە دوای ئیبراهیم لە ناو نەتەوەی ئەودا بووە سەلامی خوای لێبێ بەڵام کە خودای مەزن ئەفەرموێت﴿قَالَ لَا

---

[1] فتح الباری /۱۰/۳٤٧، مسلم/۱/۲۲۲.

[2] البقرة ۱۳۱.

[3] ابن ابی حاتم /۱/۳٦۰.

[4] العنكبوت ۲۷.

يَنَالُ عَهْدِى ٱلظَّٰلِمِينَ ﴾ فەرموی: ستەمكاران وەبەر بەڵێنی من ناكەون، هەواڵی بە ئیبراهیم داوە كە لەناو ئەوەی ئەودا ستەمكار پەیدا دەبێت، ئەو بەڵێنەی بەر ناكەوێ. وە نابێ هیچ فەرمانێكی خۆی بسپێرێ بەوانە. با لەنەوەی خەلیلەكەیش بن. بەڵام چاكەكاران ئەو داوایەی ئەو دەیانگرێتەوە، ئەوەی ئەو داوای كردووە بەریان دەكەوێت. ئیبنو جەریر دەڵێ: هەرچەندە ئەم ئایەتە هەواڵ دانە كە ستەم كاران ئەو پێشەواییەیان بەرناكەوێ، بەڵام ئاگاداری تێدایە لەلایەن خوداوە بۆ ئیبراهیمی خەلیل سەلامی خوای لێبێ كە بەو زوانە هەندێ لە نەوەی تۆ ناهەقی لە خۆیان دەكەن. ئیبنو خوەیزی مەنداد مالكی وتی: ستەمكار بۆ ئەوە ناشێ ببێتە جێنشین یان فەرمان ڕەوا یان موفتی یان شایەت یان ڕیوایەت كەر.

﴿ وَإِذْ جَعَلْنَا ٱلْبَيْتَ مَثَابَةً لِّلنَّاسِ وَأَمْنًا وَٱتَّخِذُوا۟ مِن مَّقَامِ إِبْرَٰهِـۧمَ مُصَلًّى ﴾

**ڕێزی ماڵی خودا (كەعبەی پیرۆز)**

خودای گەورە ئەفەرموێت: ﴿وَإِذْ جَعَلْنَا ٱلْبَيْتَ مَثَابَةً لِّلنَّاسِ وَأَمْنًا وَٱتَّخِذُوا۟ مِن مَّقَامِ إِبْرَٰهِـۧمَ مُصَلًّى﴾ لەو كاتەشا بڕیارمان دا كە ماڵی كەعبە پەناگە و مەڵبەندی خەڵكی بێ و جێی ئاسایش بێ ئیبنو عەباس ئەڵێت: خواست و مەبەستی خۆیانی تیا بەجێ ئەهێنن. دەهاتن بۆ كەعبە و پاشان دەگەڕانەوە بۆلای كەس و كاریان دیسان دەگەڕانەوە بۆلای. ئەبو جەعفەری ڕازی ئەڵێت: لە ڕەبیعی كوڕی ئەنەسەوە لە ئەبو لعالیەوە: ﴿وَإِذْ جَعَلْنَا ٱلْبَيْتَ مَثَابَةً﴾ لەوكاتەشا بڕیارمان دا كەماڵی كەعبە پەناگای خەڵكی بێ بە دڵنیایی، ئەڵێت: دڵنیابێ لە دوژمن چەكی تیا هەڵگیرێ، چونكە لەسەر دەمی نەفامیدا خەڵكی لە دەور و بەری دەفڕێنرا. بەڵام ئەوان ئێستا دڵنیان و دیل ناكرێن[1]. ڕیوایەت كراوە لە موجاهید و عەتاو سوددی و قەتادە و ڕەبیعی كوڕی ئەنەسەوە ئەڵێن: هەركەسێ چوبێتە ناوی دڵنیا بووە[2]. مەبەستی ئەم ئایەتە ئەوەیە، خودای مەزن باسی ڕێزو قەدری مەككەی پیرۆز دەكا بەو جۆرەی كە خودا خۆی بڕیاری داوە وەسف بكرێ و كردویەتی بە پەناگایەك گیانەكان ئارەزوو مەندن بۆی و سۆزیان هەیە بۆی. داخوازی و مەبەستی تیا بەجێ ناهێنن، واتە: هەقی تیا نەسەنرێ باهەموو ساڵێ كەسێكی تاوانبار تێیدا بێت و بڕوات. لەبەر قبوڵ بوونی دوعاكەی ئیبراهیمی خەلیل سەلامی خوای لێبێ وەك خودای مەزن لەسەر زمانی ئیبراهیم فەرمویەتی: ﴿رَّبَّنَآ إِنِّىٓ أَسْكَنتُ مِن ذُرِّيَّتِى بِوَادٍ غَيْرِ ذِى زَرْعٍ عِندَ بَيْتِكَ ٱلْمُحَرَّمِ رَبَّنَا لِيُقِيمُوا۟ ٱلصَّلَوٰةَ فَٱجْعَلْ أَفْـِٔدَةً مِّنَ ٱلنَّاسِ تَهْوِىٓ إِلَيْهِمْ وَٱرْزُقْهُم مِّنَ ٱلثَّمَرَٰتِ لَعَلَّهُمْ

---

[1] الطبری /٣/٢٩ ص٩٩.

[2] ابن ابی حاتم /٣٧٠/١.

يَشْكُرُونَ ﴿٣٧﴾ رَبَّنَآ إِنَّكَ تَعْلَمُ مَا نُخْفِى وَمَا نُعْلِنُ ۗ وَمَا يَخْفَىٰ عَلَى ٱللَّهِ مِن شَىْءٍ فِى ٱلْأَرْضِ وَلَا فِى ٱلسَّمَآءِ ﴿٣٨﴾ ٱلْحَمْدُ لِلَّهِ ٱلَّذِى وَهَبَ لِى عَلَى ٱلْكِبَرِ إِسْمَٰعِيلَ وَإِسْحَٰقَ ۚ إِنَّ رَبِّى لَسَمِيعُ ٱلدُّعَآءِ ﴿٣٩﴾ رَبِّ ٱجْعَلْنِى مُقِيمَ ٱلصَّلَوٰةِ وَمِن ذُرِّيَّتِى ۚ رَبَّنَا وَتَقَبَّلْ دُعَآءِ ﴾[1] پەروەردگارمان! دوعاکەمان قبولّ بکە. خودای مەزن وەسفی کەعبەی پیرۆزی کردووە کە کردویەتی بە شوێنی ئاسایش، گەرکەسێ چوە ئەوێ دلّنیایە، با هەرچی شی کردبێ دلّنیایە، ئەم رێزو قەدرەش مەگێن لەبەر رێزو قەدری ئەو کەسەیە کە دروستی کردووە کە ئیبراهیمی خەلیلی رەحمانە. وەك خودای مەزن ئەفەرموێت: ﴿وَإِذْ بَوَّأْنَا لِإِبْرَٰهِيمَ مَكَانَ ٱلْبَيْتِ أَن لَّا تُشْرِكْ بِى شَيْـًٔا ﴾[2] ئەو کاتە کە ئیبراهیممان لە جێی ئەم مالّ پەنادا پێمان وت: نەکەی کەس بکەی بەشەریکی من. وە ئەفەرموێت: ﴿ إِنَّ أَوَّلَ بَيْتٍ وُضِعَ لِلنَّاسِ لَلَّذِى بِبَكَّةَ مُبَارَكًا وَهُدًى لِّلْعَٰلَمِينَ ﴿٩٦﴾ فِيهِ ءَايَٰتٌۢ بَيِّنَٰتٌ مَّقَامُ إِبْرَٰهِيمَ ۖ وَمَن دَخَلَهُۥ كَانَ ءَامِنًا ﴾[3] یەکەم مالّ کە بۆ مەردم سازکراوە، هەر ئەوەیە وا لەمەککە کە زۆر بە پیت و پیرۆزە و نیشانگەی خواناسیە بۆ خەلّکی هەموو دونیا، بەلّگەی روونی تێدایە و شوێنەواری ئیبراهیمە، هەرکەسێ پەنای پێبەرێ لە هیچ شتێ ناترسێ. وە لەم ئایەتە پیرۆزەدا ئاگاداری بە شوێنەواری ئیبراهیم داوە و فەرمانی بە نوێژکردن داوە تێیدا و ئەفەرموێت: ﴿وَٱتَّخِذُوا۟ مِن مَّقَامِ إِبْرَٰهِـۧمَ مُصَلًّى ﴾ شوێنی ئیبراهیم بکەنە جێگای نوێژ.

## جێگای ئیبراهیم

سوفیانی سەوری لە سەعیدی کوڕی جوبەیرەوە ئەلّێت: ﴿وَٱتَّخِذُوا۟ مِن مَّقَامِ إِبْرَٰهِـۧمَ مُصَلًّى ﴾ شوێنی ئیبراهیم بکەنە جێگای نوێژ. وتی: بەردەکە ( الحجر ) شوێنی پێغەمبەر ئیبراهیم بووە. خودای مەزن کردیە رەحمەت، ئیبراهیم لەسەری دەوەستا و ئیسماعیل بەردی ئەدایە دەستی، ئەگەر سەری بشوردایە وەك دەلّێن پێکانی لەیەکتر جیا دەکردەوە[4]. سوددی ئەلّێت: جێگاکە ئەو بەردە بووە کە هاوسەرەکەی ئیسماعیل دایناوبو لە ژێر پێی ئیبراهیمدا سەلامی خوایان لێبێ تا سەری شۆریوە[5]. قورتوبی گێراویەتیەوە هەندێ پشتگیریان لێکردووەو هەندێکیش بەلاوازیان داناوە. رازیش هەر

---

[1] ابراهیم ٣٧-٤٠.
[2] الحج ٢٦.
[3] ال عمران ٩٦-٩٧.
[4] ابن ابی حاتم /٣٧١/١ ص٩٩.
[5] الطبری /٣/٣٥.

گێڕاویەتیەوە لە تەفسیرەکەیدا لە حەسەنی بەسری و قەتادە و ڕەبیعی کوڕی ئەنەسەوە[1]. ئیبنو ئەبی حاتەم ڕیوایەتی کردووە لە جابیرەوە کە دەربارەی حەجی پێغەمبەر(ﷺ) قسەی کردووە وتی: کاتێ کە پێغەمبەر(ﷺ) تەوافی دەکرد، عومەر پێی وت: ئەمە جێگەی باوکمانە؟ فەرمووی بەڵێ، وتی: ئایا نەیکەنە شوێنی نوێژ؟خودای گەورە ئەم ئایەتەی نارده خوارەوە: ﴿وَاتَّخِذُوا مِن مَّقَامِ إِبْرَاهِيمَ مُصَلًّى﴾ شوێنی ئیبراهیم بکەنە جێگەی نوێژ[2]. بوخاری وتی: باب: ﴿وَاتَّخِذُوا مِن مَّقَامِ إِبْرَاهِيمَ مُصَلًّى﴾ شوێنی ئیبراهیم بکەنە جێگای نوێژ وتی: مثابة، یثوبون، یانی: دەگەڕێنەوە. پاشان ڕیوایەتی کردووە لە ئەنەسی کوڕی مالیکەوە ئەڵێت: عومەری کوڕی خەتاب وتی: وتەم لە سێ شوێندا دەقا و داق بووە لەگەڵ وتەی خودای گەورە. یان وتەی خودا لە سێ شوێندا دەقا و دەق بووە لەگەڵ وتەی مندا. وتم: ئەی پێغەمبەری خودا(ﷺ)! چاك و خراپ دێتە ماڵت خۆزگە فەرمانت بە دایکانی مسوڵمانان بکردایە بە حیجاب کردن، خودای مەزن ئایەتی حیجابی نارده خوارەوە. وتی: هەواڵم پێگەیشت کە پێغەمبەر (ﷺ) سەرزەنشتی هەندێ لە خێزانەکانی کردووە، منیش چوومە لایان و وتم: ئەگەر واز نەهێنن ئەوسا خودای گەورە لەباتی ئێوە خێزانی چاکتر ئەدات بە پێغەمبەرەکەی(ﷺ) تا چوومە لای یەکێ لە خێزانەکانی، وتی: ئایا پێغەمبەری خودا(ﷺ) خۆی ناتوانێ ئامۆژگاری خێزانەکانی بکا، تا تۆ ئامۆژگاریان بکەی. خودای مەزن ئەم ئایەتەی نارده خوارەوە: ﴿عَسَىٰ رَبُّهُۥٓ إِن طَلَّقَكُنَّ أَن يُبْدِلَهُۥٓ أَزْوَاجًا خَيْرًا مِّنكُنَّ مُسْلِمَاتٍ﴾[3] ئەگەر ئێوە تەلاق بدا، پەروەردگاری ئەو ژنی لە ئێوە باشتری لەباتی ئێوە دەداتێ، ژنانێکی گەردن کەچ. ئیبنو جەریر ڕیوایەتی کردووە لە جابیرەوە ئەڵێت: پێغەمبەری خودا(ﷺ) دەستی دا لە ڕوکن یان ماچی کرد پاشان سێ جار لۆقەی کرد لە چوارەمیشا ڕۆشت، پاشان چووە مەقامی ئیبراهیم و ئەم ئایەتەی خوێند: ﴿وَاتَّخِذُوا مِن مَّقَامِ إِبْرَاهِيمَ مُصَلًّى﴾ شوێنی ئیبراهیم بکەنە جێگای نوێژ. مەقامی ئیبراهیمی خستە نێوان خۆی و بەیت و (واتە کەعبە) دووڕکات نوێژی کرد[4]. ئەمە بەشێکە لەو فەرمودەی کە موسلیم ڕیوایەتی کردووە لە سەحیحەکەیدا[5]. بوخاری ڕیوایەتی کردووە لە عەمری کوڕی دینارەوە ئەڵێت: بیستم لە ئیبنو عومەر دەیوت: پێغەمبەری خودا(ﷺ) هات و حەوت

---

[1] الرازي /٤/٤٥ ص٩٩.

[2] ابن ابي حاتم /١/٣٧٠.

[3] التحريم ٥.

[4] الطبري /٣/٦٣.

[5] مسلم /٢/٩٢٠ ص٩٩.

جار تەوافی کرد بەدەوری بەیتا، وە دوو ڕکات نوێژی لە دوای مەقامەوە کرد[1]. ئەمانە هەموو ئەوە دەسەلمێنن کە مەبەست بە مەقام بێگومان ئەو بەردەیە ( الحجر ) ئەو بەردەی کە ئیبراهیم سەلامی خوای لێبێ لەسەری ئەوەستا لەکاتی دروستکردنی کەعبەدا، کاتێ کە دیوارەکە بەرز بوەوە، ئیسماعیل سەلامی خوای لێبێ هێنای بۆئەوەی لەسەری ڕاوەستێ و بەردیدا بەدەستیەوە، بەردی ئەدا بەدەستیەوە بۆ بەرز کردنەوەی دیوارەکە. کاتێ شوێنی دیوارەکە تەواو دەبوو دەیگواستەوە بۆ شوێنی ترو دەیگێڕا بەدەوری کەعبەدا و لەسەری دەوەستا، هەرکاتێ لایەك لە دیوارەکە تەواو دەبوو دەیبردە لایەکی تری دوای ئەوە هەر بەو شێوەیە تا دیواری کەعبە تەواو بوو، وەك بەو زوانە لەبەسەرهاتی ئیبراهیم و ئیسماعیل سەلامی خوایان لێبێ باسی دێت لە دروستکردنی کەعبەدا لە ڕیوایەتەکەی ئیبنو عەباسدا کە بوخاری ڕیوایەتی کردووەکە شوێنی پێکانی دیاربوو پێیەوە، بەردەوام ئەوە زانراوەو عەرەبەکان زانیویانە لەچەرخی نەفامیدا، هەربۆیە ئەبو تالیب لە قەسیدە لامیە بەناوبانگەکەیدا وتویەتی:

وموطى إبراهيم فى الصخر رطبة علی قدمیه حافیا غیر ناعل

واتە: جێپێی ئیبراهیم لەسەر بەردەکە دیارە کە پێی پەتی بووە و نەعلی لە پێدا نەبووە. مسوڵمانانیش ئەو نیشانەیان دیوە لەسەری. ئەنەسی کوڕی مالیك ئەڵێت: مەقامم بینی کە پەنجەکانی و پاژنەی پێی سەلامی خوای لێبێ پێوە دیاربوو بەڵام دەست پیاهێنانی خەڵکی کەدەستیان پێیدا سڕیویەتەوە لای بردووە. منیش دەڵێم: ئەم مەقامە لە دێر زەمانەوە پەیوەست بوو بەدیواری کەعبەوە و شوێنەکەی ئەمڕۆ دیارە لەتەنیشت ئەو دەرگاوە لەدوای بەردەکەوە دێت لەلای ڕاستی دەرگاکەوە لەناوەوە لەو شوێنە جیادا لەوێدا[2]. ئیبراهیمی خەلیل کاتێ کە لە دروستکردنی کەعبە بوەوە لەسەر دیواری کەعبە داینا کاتێ کە بیناکە بەلایدا تەواو بوو، لەوێدا بەجێی هێشت، هەربۆیە و الله أعلم فەرمان درا بەنوێژکردن لەو شوێنەدا لەکاتی لێبونەوە لە تەواف، وە جێی خۆیەتی ئەوە لەلای مەقامی ئیبراهیمدا بێ، چونکە لەوێدا دروستکردنی کەعبە تەواو بوو، بێگومان گەورەی مسوڵمانان عومەری کوڕی خەتاب ڕەزای خوای لێبێ خستیە دوای دیواری کەعبەوە. کە یەکێك بووە لە پێشەوا ڕێنیشاندەرەکان و جێنشینە شارەزاکان کە فەرمانمان پێکراوە بە شوێن کەوتنیان. یەکێکە لەو دوو پیاوە کە پێغەمبەری خودا(ﷺ) دەربارەیان فەرمویەتی: پەیڕەوی ئەودوو کەسە بکەن لە دوای من ئەبو بەکرو عومەر[3]. عومەر ئەو کەسەیە کە خودای مەزن قورئانی ڕەوانە کردووە هاوڕای ئەوە لە

---

[1] فتح الباري /٣/٥٨٦.

[2] قد أزيلت هذه البقعة، و رفع مقام إبراهيم فى عمئد قيصر من الزجاج و السياج.

[3] الترمزي /٣٦٦٢ ص١٠٠ حه سه نه.

نوێژکردن لەلای مەقامی ئیبراهیمدا. هەربۆیە هیچ کەسێ لە هاوەڵەکانی پێغەمبەر(ﷺ) ناڕەزاییان دەنەبڕیوە لەو بارەیەوە ڕەزای خوا لەهەموو هاوەڵەکانی عەبدوڕەزاق لە ئیبنو جورەیجەوە ئەڵێت: عەتا و چەندین کەسی تریش لە هاوەڵەکانمان وتیان: یەکەم کەسێ کە گواستیەوە عومەری کوڕی خەتاب بوو ڕەزای خوای لێبێ دیسان عەبدوڕەزاق ڕیوایەتی کردووە لە موجاهیدەوە ئەڵێت: یەکەم کەسێ کەمەقامی خستە دواوە و لەم شوێنەی خۆیدا دای ناوە ئێستا عومەری کوڕی خەتاب بووە ڕەزای خوای لێبێ حافیز ئەبو بەکر ئەحمەدی کوڕی عەلی کوڕی حوسێنی بەیهەقی ڕیوایەتی کردووە لە عائیشەوە ڕەزای خوای لێبێ وتی: مەقام لە زەمانی پێغەمبەر و(ﷺ) زەمانی ئەبو بەکردا ڕەزای خوای لێبێ( لکابو) پەیوەست بوو بەبەیتەوە واتە: کەعبەوە پاشان عومەری کوڕی خەتاب ڕەزای خوای لێبێ خستیە دواوە. ئەم فەرمودە سەنەدەکانی سەحیحە لەگەڵ ئەو سەنەدانەی پێشیشدا.

﴿وَعَهِدْنَآ إِلَىٰٓ إِبْرَٰهِـۧمَ وَإِسْمَـٰعِيلَ أَن طَهِّرَا بَيْتِىَ لِلطَّآئِفِينَ وَٱلْعَـٰكِفِينَ وَٱلرُّكَّعِ ٱلسُّجُودِ ﴿١٢٥﴾ وَإِذْ قَالَ إِبْرَٰهِـۧمُ رَبِّ ٱجْعَلْ هَـٰذَا بَلَدًا ءَامِنًا وَٱرْزُقْ أَهْلَهُۥ مِنَ ٱلثَّمَرَٰتِ مَنْ ءَامَنَ مِنْهُم بِٱللَّهِ وَٱلْيَوْمِ ٱلْـَٔاخِرِ ۖ قَالَ وَمَن كَفَرَ فَأُمَتِّعُهُۥ قَلِيلًا ثُمَّ أَضْطَرُّهُۥٓ إِلَىٰ عَذَابِ ٱلنَّارِ ۖ وَبِئْسَ ٱلْمَصِيرُ ﴿١٢٦﴾ وَإِذْ يَرْفَعُ إِبْرَٰهِـۧمُ ٱلْقَوَاعِدَ مِنَ ٱلْبَيْتِ وَإِسْمَـٰعِيلُ رَبَّنَا تَقَبَّلْ مِنَّآ ۖ إِنَّكَ أَنتَ ٱلسَّمِيعُ ٱلْعَلِيمُ ﴿١٢٧﴾ رَبَّنَا وَٱجْعَلْنَا مُسْلِمَيْنِ لَكَ وَمِن ذُرِّيَّتِنَآ أُمَّةً مُّسْلِمَةً لَّكَ وَأَرِنَا مَنَاسِكَنَا وَتُبْ عَلَيْنَآ ۖ إِنَّكَ أَنتَ ٱلتَّوَّابُ ٱلرَّحِيمُ ﴿١٢٨﴾﴾

**فەرمان دان بە خاوێن کردنەوەی ماڵی خودا**

خودای گەورە ئەفەرموێت: ﴿وَعَهِدْنَآ إِلَىٰٓ إِبْرَٰهِـۧمَ وَإِسْمَـٰعِيلَ أَن طَهِّرَا بَيْتِىَ لِلطَّآئِفِينَ وَٱلْعَـٰكِفِينَ وَٱلرُّكَّعِ ٱلسُّجُودِ﴾ ئیبراهیم و ئیسماعیلمان ڕاسپارد کە ماڵەکەم بۆ ئەوانەی دەسوڕێنەوەو بۆ ئەوانەی هەر لەوێ دەبن و بۆ ئەوانەی کڕنوش و سوژدەم بۆدەبەن، خاوێنی بکەن. حەسەنی بەسری ئەڵێت: ﴿وَعَهِدْنَآ إِلَىٰٓ إِبْرَٰهِـۧمَ وَإِسْمَـٰعِيلَ﴾ ئیبراهیم و ئیسماعیلمان ڕاسپاردوە. یانی: خودا فەرمانی پێکردوون کە ماڵەکەی خاوێن بکەنەوە لە خراپە و پیسی و چەپەڵی و هیچ شتێکی لەوانەوە پێوە نەهێڵن[1]. ئیبنو جەریر ئەڵێت: وتم بە عەتا ڕاسپاردەکەی کامەیە؟ وتی: فەرمانەکەی. سەعیدی کوڕی جوبەیر ئەڵێت: لە ئیبنو عەباسەوە لەم دەقەدا کە خودای مەزن ئەفەرموێت: ﴿أَن طَهِّرَا بَيْتِىَ لِلطَّآئِفِينَ وَٱلْعَـٰكِفِينَ﴾وتی: ماڵەکەم بۆئەوانەی لەدەوری دەسوڕێنەوە و ئەوانەی هەر لەوێ دەبن خاوێن بکەنەوە. یانی: لە بتەکان خاوێنی

[1] ابن ابی حاتم /٣٧٣/١ ص١٠١.

بکەنەوە. موجاهید و سەعیدی کوڕی جوبەیرئەڵێن: ﴿طَهِّرَا بَيْتِيَ لِلطَّآئِفِينَ﴾ ماڵەکەم پاك بکەنەوە بۆ ئەوانەی لەدەوری دەسوڕێنەوە. یانی: خاوێنی بکەنەوە لە بت و قسەی ناشرین و بوختان و پیسی و چەپەڵی. خودای مەزن ئەفەرموێت: ﴿لِلطَّآئِفِينَ﴾ تەواف بەدەوری کەعبەدا زانراوە، وە لە سەعیدی کوڕی جوبەیرەوە کە ئەڵێت: ﴿لِلطَّآئِفِينَ﴾ یانی: بۆ ئەوانەی لەڕێی دورەوە دێن بۆ ماڵی خودا[1] ﴿وَٱلْعَٰكِفِينَ﴾ بۆ ئەوانەی کە لەناویدان. هەر بەو جۆرەش ڕیوایەت کراوە لە قەتادە و ڕەبیعی کوڕی ئەنەسەوە،کە تەفسیری: ﴿وَٱلْعَٰكِفِينَ﴾ یان کردووە بەو خەڵکەی کە تێیدا دانیشتوون. وەك سەعیدی کوڕی جوبەیریش وتویەتی[2]. ڕیوایەت کراوە لە ئیبنو عەباسەوە: ﴿وَٱلرُّكَّعِ ٱلسُّجُودِ﴾ وتی: کاتێ کە نوێژی تیا دەکەن کە بریتیە لە کڕنوش و سوژدە بردن[3]. عەتا و قەتادەش هەروایان وتووە[4]. خاوێن کردنەوەی مزگەوتەکان لەم ئایەتە پیرۆزە و ئەم ئایەوە وەرگیراوە کە خودای مەزن ئەفەرموێت: ﴿ فِي بُيُوتٍ أَذِنَ ٱللَّهُ أَن تُرْفَعَ وَيُذْكَرَ فِيهَا ٱسْمُهُۥ يُسَبِّحُ لَهُۥ فِيهَا بِٱلْغُدُوِّ وَٱلْأَصَالِ ﴾[5] لەناو ماڵانێکدا خودا ئیزنی داوە کە دەستی ڕێزیان لەسەر بێ و ناوی ئەویان(خودایان) تیا ببرێ هەموو بەیانی و ئێواران. وە فەرمودەی زۆر هاتووە لە سونەنەکاندا کە فەرمانی داوە بە پاك و خاوێنی و بۆن خۆش کردنی و پاراستنی لە پیس و پۆخڵی و هەرشتێکی ترلەوانە. هەبۆیە پێغەمبەری خودا(ﷺ) فەرمویەتی: بێگومان مزگەوتەکان دروست کراوە بۆ ئەوەی کە بۆی دروستکراوە[6]. سوپاس و ستایش هەر بۆ خودای مەزنە.

**حەرام کردنی مەککە**

خودای گەورە ئەفەرموێت: ﴿وَإِذْ قَالَ إِبْرَٰهِۦمُ رَبِّ ٱجْعَلْ هَٰذَا بَلَدًا ءَامِنًا وَٱرْزُقْ أَهْلَهُۥ مِنَ ٱلثَّمَرَٰتِ مَنْ ءَامَنَ مِنْهُم بِٱللَّهِ وَٱلْيَوْمِ ٱلْءَاخِرِ﴾ ئیبراهیم بە پاڕانەوە وتی: ئەی پەروەردگاری من! ئەم شارە بێوەی بهێڵە، خەڵکەکەشی، هەرکەسێ بڕوای بە خودا و ڕۆژی قیامەت هێناوە، لەبەرو بووم تێریان بکە. ئیمامی ئەبو

---

[1] ابن ابی حاتم /١/٣٧٥.
[2] ابن ابی حاتم /١/٣٧٥.
[3] ابن ابی حاتم /١/٣٧٦.
[4] ابن ابی حاتم/١/٣٧٦.
[5] النور ٣٦.
[6] مسلم /١/٣٩٧.

جەعفەری کوڕی جەریری کوڕی عەبدڵلا ئەڵێت: پێغەمبەری خودا(ﷺ) فەرمویەتی: بێگومان ئیبراهیم شەڕو ئاشوبی لە مەککەدا حەرام کرد منیش حەرامم کردوە لەمسەر بۆ ئەو سەری مەدینە کە درەختە سروشتیەکانی ببڕدرێت یان نێچیری بکوژرێت[١]. هەر بەو جۆرە نەسائی ڕیوایەتی کردووە[٢]. موسلیمیش هێناویەتی[٣]. چەندین فەرمودەی تر هاتووە بەڵگەیە لەسەر ئەوەی خودای مەزن مەککەی حەرام کردووە لە پێش دروستکردنی ئاسمانەکان و زەمین، وەك لە هەردوو سەحیحەکەدا هاتووە لە عەبدڵلای کوڕی عەباسەوە ڕەزای خوای لێبێ ئەڵێت: پێغەمبەری خودا(ﷺ) لە ڕۆژی فەتحی مەککەدا فەرموی: بێ گومان خودای مەزن ئەم شارەی(مەککە)حەرام کردوە لەو ڕۆژەی ئاسمانەکان و زەمینی دروستکردووە، ئەو حەرامە بە حەرام کردنی خودا تا ڕۆژی قیامەت، وە شەڕیشی تیا حەلاڵ نەکراوە بۆ هیچ کەس پێش من وە بۆ منیش حەلاڵ نەکراوە تەنیا ساتێك نەبێ لە ڕۆژێکدا، ئەو حەرامە بە حەرام کردنی خودا تا ڕۆژی قیامەت، دڕکی نابڕێت و نێچیری ڕاوناکرێت و ون بووی هەڵناگیرێتەوە مەگین کەسێ جاڕی بۆ بدات، گیای نادروێتەوە. ئیبنو عەباس ئەڵێت: پێغەمبەری خودا(ﷺ)جگە لە سوڕناتوك چونکە بۆ پیشەوەری وماڵەکانیان بەکاری دەهێنن. فەرموی: جگە لە سوڕناتوك[٤]. ئەمە وتەی موسلیمە، بەڵام بوخاری و موسلیم هەردوکیان هەر بەم شێوەیە ڕیوایەتیان کردوە دوای ئەوە لە سەفیەی کچی شەیبەوە لە پێغەمبەری خوداوە(ﷺ)[٥]. وە لەئەبو شورەیحی عەدەویەوە کە وتویەتی بە عەمری کوڕی سەعید کە نوێنەری ڕەوانە دەکرد بۆ مەککە: ئیزنم پێبدە ئەی ئەمیر قسەیەکت بۆ باس بکەم کە پێغەمبەری خودا(ﷺ)پێی هەڵساوە لەو بەیانیەی ڕۆژی فەتحا، بەگوێی خۆم بیستم و دڵم وەری گرت و بە هەردوو چاوم بینیم کاتێ کە ئەوەی فەرموو سوپاس و ستایشی خودای کردوو پاشان فەرموی: بێگومان خودا مەککەی حەرام کرد، بەڵام خەڵکی حەرامیان نەکرد، دروست نیە بۆ هیچ کەسێ کە بڕوای بەخودا و ڕۆژی دایی ببێ خوێنی تیا بڕێژێ، وە هیچ درەختێکی تیا ببڕێ ئەگەر کەسێ دەرفەتی وەرگرت بە جەنگی پێغەمبەری خودا(ﷺ) ئێوە بڵێن: بێگومان خودا ئیزنی بە پێغەمبەرەکەی دا، بەڵام ئیزنی بە ئێوە نەداوە بەڕاستی ئیزنی منیدا ساتێك لە ڕۆژێ، وە ئەمڕۆ حورمەتەکەی گەڕاوەتەوەو وەك حورمەتەکەی دوێنێ کە بویەتی، ئەوەی ئامادەیە با ئەوانە ئاگادار بکا کە ئامادە نیە، وتراوە بە ئەبو شورەیح: عەمر چی پێوتی؟ وتی: من لەتۆ چاکتر لەوە ئاگادارم ئەی

---

[١] الطبري /٣/٤٨ ص١٠٠.

[٢] النسائي في الكبرى /٢/٤٨٧ /سه حيحه.

[٣] مسلم /٢/٩٩٢.

[٤] فتح الباري /٤/٥٦/، مسلم/٢/٩٨٦ ص١٠١.

[٥] فتح الباري /٣/٢٥٣.

ئەبو شورەیح، بێگومان ئەمە حەرەمە پەنای یاخی و ئەوەی بە خوێنەوە ڕای کردبێ و تاوان کار بێ نادات. بوخاری وموسایم ڕیوایەتیان کردووە[1]. کاتێ کەئەمە زانرا هیچ دژایەتیەك نیە لە نێوان ئەو فەرمودانەی بەڵگەن لەسەر ئەوە کە خودای مەزن مەککەی حەرام کردوە لەو ڕۆژەی ئاسمانەکان و زەمینی دروست کردوە و لە نێوان ئەو فەرمودانەی بەڵگەن لەسەر ئەوە کە ئیبراهیمی خەلیل سەلامی خوای لێبێ– حەرامی کردوە، چونکە ئیبراهیم لەلایەن خوداوە فەرمانی داوە تێیداو حەرامی کردووە، چونکە بەردەوام شارێکی حەرام بووە لەلای خودا لە پێش ئەوە ئیبراهیم دروستی بکا. وەك چۆن پێغەمبەری خودا(ﷺ) لەلای خودا نوسراوە کەدواین پێغەمبەرە، وە ئادەمیش هێشتا هەر لەناو قوڕەکەیدا بوو، لەگەڵ ئەویشا ئیبراهیم سەلامی خوای لێبێ وتی: ﴿ رَبَّنَا وَٱبۡعَثۡ فِيهِمۡ رَسُولٗا مِّنۡهُمۡ ﴾[2] پەروەردگارمان! پێغەمبەرێك هەر لەوان ڕەوانە بکە، خودای مەزن پاڕانەوەکەی لێ قبوڵ کرد، بەو جۆرەی خودا لە پێشا بڕیاری لێ دابوو لە زانیاری و قەدەری خۆیدا، هەربۆیە لە فەرمودەدا هاتووە کە وتیان: ئەی پێغەمبەری خودا(ﷺ) ئاگادارمان بکە لەسەرتای فەرمانەکەت، فەرموی: پاڕانەوەی ئیبراهیمی باوکم سەلامی خوای لێبێ وە مژدەی عیسای کوڕی مریەم، وە دایکم بینی وەك ئەوە ڕوناکیەك لێیەوە دەرچووە، کۆشکەکانی شامی پێ ڕوون بوەتەوە[3]. بە ویستی خودا بەو زوانە باسی دێت.

## پاڕانەوەی ئیبراهیم بۆ ئاسایشی مەککە و ڕۆزی تێرو تەواوەتی

خودای گەورە باسی ئیبراهیمی خەلیل دەکاسەلامی خوای لێبێ کەوتویەتی: ﴿رَبِّ ٱجۡعَلۡ هَٰذَا بَلَدًا ءَامِنٗا﴾ ئیبراهیم بەپاڕانەوە وتی: ئەی پەروەردگاری من! ئەم شارە بێوەی بهێڵە، لە ترس لای بدە و خەڵکەکەی بێ ترس بن، خودای مەزن بەشەرعی و بەقەدەریش ئەوەی کرد. وەك ئەفەرموێت: ﴿وَمَن دَخَلَهُۥ كَانَ ءَامِنٗا﴾[4] هەرکەسێ چوبێتە ناوی بێترس بووە. وە ئەفەرموێت: ﴿أَوَلَمۡ يَرَوۡاْ أَنَّا جَعَلۡنَا حَرَمًا ءَامِنٗا وَيُتَخَطَّفُ ٱلنَّاسُ مِنۡ حَوۡلِهِمۡ﴾[5] ئایا نابینن مەککەمان بۆکردونە شوێنی هێمنی، کە خەڵکی دەورو بەریان دەفڕێنرێت؟ چەندین ئایەتی تریش لەم شێوەیە هاتووە. لە پێشەوە چەند فەرمودە هات لەسەر حەرام کردنی شەڕ کردن لە مەککەدا. وە لە سەحیحی موسلیما هاتووە لە جابیرەوەئەڵێت: بیستم لە

---

[1] فتح الباری/٤/٥٠/، مسلم/٢/٩٨٧ ص١٠١.

[2] البقرة ١٢٩.

[3] أحمد /٥/٢٦٢ سه حیحه.

[4] ال عمران ٩٧.

[5] العنكبوت ٦٧.

پێغەمبەری خودا(ﷺ)ئەیفەرموو: حەلاڵ نیە بۆ هیچ کەسێ لە مەککەدا چەك هەلگرێ[١]. وە دەربارەی ئەم سوورەتە فەرمووی: ﴿رَبِّ اجْعَلْ هَٰذَا بَلَدًا آمِنًا﴾ئەی پەروەردگاری من! ئەم شارە بێوەی بهێڵە. ئەمە جێی خۆیەتی، چونکە لە پێش دروستکردنی کەعبەوە بووە. خودای گەورە لە سوورەتی ئیبراهیمدا فەرمویەتی: ﴿ وَإِذْ قَالَ إِبْرَاهِيمُ رَبِّ اجْعَلْ هَٰذَا الْبَلَدَ آمِنًا ﴾[٢] کاتێ کە ئیبراهیم وتی: پەروەردگارم هێمنایەتی بدە بەم شارە. ئەمەش لێرەدا هەر جێی خۆیەتی. چونکە و الله أعلم وەك ئەوە وایە دووبارە دوعاکەی کردبێتەوە، دوای دروستکردنی ماڵی خودا و جێگیر بوونی کەس و کاری لەوێدا، وە دوای لەدایك بونی ئیسحاق کە لە ئیسماعیل بچوکتر بووەبە سیانزە ساڵ، هەربۆیە لە کۆتایی دوعاکەیدا وتی: ﴿ الْحَمْدُ لِلَّهِ الَّذِي وَهَبَ لِي عَلَى الْكِبَرِ إِسْمَاعِيلَ وَإِسْحَاقَ ۚ إِنَّ رَبِّي لَسَمِيعُ الدُّعَاءِ ﴾[٣] سوپاس بۆ ئەو خودایە کە بەپیری ئیسماعیل و ئیسحاقی بەمن بەخشیوە. پەروەردگارم نزای نزاکار دەبیستێ. پاشان خودای مەزن ئەفەرموێت: ﴿وَارْزُقْ أَهْلَهُ مِنَ الثَّمَرَاتِ مَنْ آمَنَ مِنْهُم بِاللَّهِ وَالْيَوْمِ الْآخِرِ ۖ قَالَ وَمَن كَفَرَ فَأُمَتِّعُهُ قَلِيلًا ثُمَّ أَضْطَرُّهُ إِلَىٰ عَذَابِ النَّارِ ۖ وَبِئْسَ الْمَصِيرُ﴾ وە رۆزی خەڵکەکەیشی بدە لە بەروبووم و میوەهات ئەوانەیان کە بڕوایان بە خودا و بە رۆژی دوایی هەیە، خودا فەرموی: ئەوەشی بێبڕوابێ وادەکەم سەردەمێکی کەم رابیبوێرێ، ئەوسا بەرەو ئازاری تینی ئاگرو چارەڕەشی بەرێکی دەکەم، ئای چ ئاکامێکی خراپە. ئیبنو جەریر ڕیوایەتی کردووە لە ئوبەی کوڕی کەعبەوە ئەڵێت: ﴿قَالَ وَمَن كَفَرَ فَأُمَتِّعُهُ قَلِيلًا ثُمَّ أَضْطَرُّهُ إِلَىٰ عَذَابِ النَّارِ ۖ وَبِئْسَ الْمَصِيرُ﴾ فەرموی: ئەوەش بێ بڕوابێ وادەکەم سەردەمێکی کەم رابیبوێرێ، ئەوسا بەرەو ئازارو تینی ئاگرو چارەڕەشی بەرێی دەکەم ئای چ ئاکامێکی خراپە. ئەوە قسەی خودای گەورەیە[٤]. ئەمەش قسەی موجاهید و عیکرەمەیە[٥]. وە ئیبنو ئەبی حاتەم ڕیوایەتی دکردووە لە ئیبنو عەباسەوە لەمەدا کە خودای مەزن ئەفەرموێت: ﴿رَبِّ اجْعَلْ هَٰذَا بَلَدًا آمِنًا وَارْزُقْ أَهْلَهُ مِنَ الثَّمَرَاتِ مَنْ آمَنَ مِنْهُم بِاللَّهِ وَالْيَوْمِ الْآخِرِ﴾ ئەی پەروەردگاری من! ئەم شارە بێوەی بهێڵەو رۆزی خەڵکەکەی بدە لە بەروبووم و میوەهات ئەوانەی کە بڕوایان بە خودا و رۆژی دوایی هەیە. ئیبنو عەباس ئەڵێت: ئیبراهیم تایەبەتی کردبوو بەوانەوە کە خاوەنباوەڕن، خەڵکی بێباوەڕی لێ جیا کردبووەوە. خودای

---

[١] مسلم/٢/٩٨٩ .

[٢] إبراهيم ٣٥.

[٣] إبراهيم ٣٩.

[٤] الطبري /٣/٥٣ ص١٠١.

[٥] الطبري /٣/٥٤.

گەورە ئەوەی ناردە خوارەوەو فەرمووی ئەوانەش کە خوانەناسن هەر ڕۆزیان پێئەدەم، ئایامن کەسێ دروستکەم ڕۆزی نەدەم؟ وادەکەم ماوەیەکی کەم ڕابوێرن پاشان بەرەو ئازاری ئاگرو چارەڕەشی بەرێی دەکەم، ئای چ ئاکامێکی خراپە[1]. پاشان ئیبنو عەباس ئەم ئایەتەی خوێندەوە کە خودای مەزن ئەفەرموێت: ﴿ كُلًّا نُّمِدُّ هَٰٓؤُلَآءِ وَهَٰٓؤُلَآءِ مِنۡ عَطَآءِ رَبِّكَۚ وَمَا كَانَ عَطَآءُ رَبِّكَ مَحۡظُورًا ﴾[2] هەموولایان چ ئەوان و چ ئەمانە لە خەلاتی پەروەردگارت بێبەش ناکەین، خەلاتی پەروەردگاری تۆ هیچ ڕێگری لێ نیە. ئیبنو مەردوەیهی ڕیوایەتی کردووە. وە ڕیوایەت کراوە لە عیکرەمەو موجاهیدیشەوە هەر بەو جۆرە. ئەمە وەك ئەو ئایەتە وایە کە خودای مەزن ئەفەرموێت: ﴿إِنَّ ٱلَّذِينَ يَفۡتَرُونَ عَلَى ٱللَّهِ ٱلۡكَذِبَ لَا يُفۡلِحُونَ ﴿٦٩﴾ مَتَٰعٞ فِي ٱلدُّنۡيَا ثُمَّ إِلَيۡنَا مَرۡجِعُهُمۡ ثُمَّ نُذِيقُهُمُ ٱلۡعَذَابَ ٱلشَّدِيدَ بِمَا كَانُواْ يَكۡفُرُونَ ﴾[3] ئەوانەی درۆ بۆ خوا هەڵدەبەستن ڕزگار نابن ڕابواردنێکی کەم لە دونیادا، لەدوایدا دەگەڕێنەوە بۆلامان لەپاش ئەوە سزای زۆر توندیان ئەدەین بەهۆی ئەوەی کە بڕوایان نەهێنا. وە ئەفەرموێت: ﴿ وَمَن كَفَرَ فَلَا يَحۡزُنكَ كُفۡرُهُۥٓۚ إِلَيۡنَا مَرۡجِعُهُمۡ فَنُنَبِّئُهُم بِمَا عَمِلُوٓاْۚ إِنَّ ٱللَّهَ عَلِيمُۢ بِذَاتِ ٱلصُّدُورِ ﴿٢٣﴾ نُمَتِّعُهُمۡ قَلِيلٗا ثُمَّ نَضۡطَرُّهُمۡ إِلَىٰ عَذَابٍ غَلِيظٖ ﴾[4] هەرکەس بێباوەڕ بوو، با بێ بڕواییەکەی خەفەت بارت نەکا، هەموو دێنەوە لای خۆمان، ئەوسا ئاگاداریان دەکەین کە چیان کردووە، خودا ئاگای لەڕازی دڵانە وادەکەین کەمێ ڕابوێرن، پاشان ناچار بەرەو ئازاری دژواریان ڕادەکێشین. وە ئەفەرموێت: ﴿وَلَوۡلَآ أَن يَكُونَ ٱلنَّاسُ أُمَّةٗ وَٰحِدَةٗ لَّجَعَلۡنَا لِمَن يَكۡفُرُ بِٱلرَّحۡمَٰنِ لِبُيُوتِهِمۡ سُقُفٗا مِّن فِضَّةٖ وَمَعَارِجَ عَلَيۡهَا يَظۡهَرُونَ ﴿٣٣﴾ وَلِبُيُوتِهِمۡ أَبۡوَٰبٗا وَسُرُرًا عَلَيۡهَا يَتَّكِـُٔونَ ﴿٣٤﴾ وَزُخۡرُفٗاۚ وَإِن كُلُّ ذَٰلِكَ لَمَّا مَتَٰعُ ٱلۡحَيَوٰةِ ٱلدُّنۡيَاۚ وَٱلۡأٓخِرَةُ عِندَ رَبِّكَ لِلۡمُتَّقِينَ ﴾[5] خۆئەگەر بڕیار وانەبوایە، نابێ مەردم یەك تیرە بن، وامان دەکرد میچ و بان و پلەکانیماڵەکانی ئەوانەی خوانەناسن لە زیو بوایە و بە پلەکانی ژێردا سەریان کەون هەموو دەرگای ماڵەکانیشیان لە زیو بوایە و لە تەختی زیوینم دەدانێ، کەلەسەریان پاڵ دەنەوە شتی تری هەمەڕەنگیش، گشت ئەمانە هەر بۆ خۆشگوزەرانی ژینی ئەم دونیان. ماڵی ئەولاش پەروەردگارت هەر

---

[1] ابن ابی حاتم/١/٣٧٧.

[2] الاسراء ٢٠.

[3] یونس٦٩ — ٧٠.

[4] لوقمان ٢٣-٢٤.

[5] الزخروف ٣٣-٣٥.

بۆ ئەوانەی داناوە کە لە خودای خۆیان دەترسن. پاشان خودای مەزن ئەفەرموێت: ﴿ثُمَّ أَضْطَرُّهُۥٓ إِلَىٰ عَذَابِ ٱلنَّارِ وَبِئْسَ ٱلْمَصِيرُ﴾ ئەوسا بەرەو ئازاری توندی ئاگرو چارە ڕەشی بەرێی دەکەم ئای ئەنجامێکی خراپە. واتە: دوای ئەو ڕابواردنە کەمەی دونیا بەرەو سزای توندی ئاگری دەبەین کە شوێنێکی خراپە. واتە: خودای مەزن مۆڵەتیان ئەدات و پەتیان بۆ شل دەکا تا لەپڕ دەیان گرێ و زۆر بەتوندی سزایان ئەدات. وەك ئەم ئایەتە کە خودای مەزن ئەفەرموێت: ﴿وَكَأَيِّن مِّن قَرْيَةٍ أَمْلَيْتُ لَهَا وَهِىَ ظَالِمَةٌ ثُمَّ أَخَذْتُهَا وَإِلَىَّ ٱلْمَصِيرُ﴾[1] بە زۆر شاران کە ستمکار بوون مۆڵەتم دا و لەپاشانا وەبەر تورەیی خۆم خستن پاشە ڕۆژیش هەر بۆلای خۆمە. وە لە هەردوو سەحیحەکەدا هاتووە: هیچ کەسێ لەسەر ئازارێ کە بیستبێتی لە خودا بەئارام تر نیە. ئەوانە خوانەناسان منداڵی بۆ دادەنێن. کەچی ئەو ڕۆزیان ئەدا و تەندروستیان ئەکا. وە هەر لە فەرمودەی سەحیحدا هاتووە: خودا مۆڵەتی ستەمکار ئەدات تا کاتێ کە گرتی لەدەستی دەرناچێ. پاشان ئەم ئایەتەی خوێند: ﴿وَكَذَٰلِكَ أَخْذُ رَبِّكَ إِذَآ أَخَذَ ٱلْقُرَىٰ وَهِىَ ظَالِمَةٌ إِنَّ أَخْذَهُۥٓ أَلِيمٌ شَدِيدٌ﴾[2] ئاوایە غەزەبی پەروەردگاری تۆ کاتێ شارانێ دادەگرێ کە خەڵکەکەی ستەمکارن ئەو ئازارەی خودا دەیدا زۆر بەئازارو زۆر دژوارە.

## دروستکردنی کەعبە و پاڕانەوە بۆ وەرگرتنی ئەو کارە

خودای گەورەئەفەرموێت: ﴿وَإِذْ يَرْفَعُ إِبْرَٰهِـۧمُ ٱلْقَوَاعِدَ مِنَ ٱلْبَيْتِ وَإِسْمَٰعِيلُ رَبَّنَا تَقَبَّلْ مِنَّآ إِنَّكَ أَنتَ ٱلسَّمِيعُ ٱلْعَلِيمُ ﴿١٢٧﴾ رَبَّنَا وَٱجْعَلْنَا مُسْلِمَيْنِ لَكَ وَمِن ذُرِّيَّتِنَآ أُمَّةً مُّسْلِمَةً لَّكَ وَأَرِنَا مَنَاسِكَنَا وَتُبْ عَلَيْنَآ إِنَّكَ أَنتَ ٱلتَّوَّابُ ٱلرَّحِيمُ﴾ لەو کاتەشدا کە ئیبراهیم و ئیسماعیل بناغەیماڵەکەی خودایان بەرزدەکردەوە، دەیانوت: پەروەردگارمان، لێمان قبوڵ کەی، تۆ هەر خۆت زۆر بیسەر و زۆر زانای. پەروەرێنمان خۆت وامان لێبکە تا سەر بەرفەرمانت بین و نەوەکانمان واڕابێنە کۆمەڵێك بن لە فەرمانی تۆ دەرنەچن و ڕێوشوێنی تۆپەرستیمان نیشان دەو تۆبەمان لێ قبوڵ بکە، تۆی تۆبە قبوڵ دەکەی و دلۆڤانی ﴿ٱلْقَوَاعِدَ﴾ کۆی (قاعدەیە)بریتیە لە کۆڵەکە و بناغە. خودای مەزن ئەفەرموێت: ئەی موحەمەد(ﷺ)! دروستکردنی کەعبە وەبیر هۆزەکەت بێنەوە کە ئیبراهیم و ئیسماعیل سەلامی خوایان لێبێ پێی هەڵسان و دیوارەکانیان بەرز دەکردەوەو دەیان ووت: ﴿رَبَّنَا تَقَبَّلْ مِنَّآ إِنَّكَ أَنتَ ٱلسَّمِيعُ

---

[1] الحج ٤٨.

[2] هود ١٠٢.

﴿ٱلۡعَلِيمُ﴾ پەروەردگارمان لێمان قبولٚ بکەی، تۆ هەر خۆت زۆر بیسەر و زۆر زانای. قورتوبی و کەسانی تریش گێڕاویانەتەوە لە ئوبەیی و ئیبنو مەسعودەوە کە هەردوکیان دەیانخوێندەوە: ﴿وَإِذۡ يَرۡفَعُ إِبۡرَٰهِـۧمُ ٱلۡقَوَاعِدَ مِنَ ٱلۡبَيۡتِ وَإِسۡمَٰعِيلُ ویقولان رَبَّنَا تَقَبَّلۡ مِنَّآۖ إِنَّكَ أَنتَ ٱلسَّمِيعُ ٱلۡعَلِيمُ﴾[1] کاتێ کە ئیبراهیم و ئیسماعیل بناغەی ماڵەکەی خوایان بەرز کردەوە دەیانوت: پەروەردگارمان لێمان قبولٚ بك،. تۆ هەر خۆت زۆر بیسەر و زۆر زانای. منیش دەڵێم: قسەکانیان دوای ئەوە دەبێتە بەڵگە لەسەر ئەمە کە دەڵێن: ﴿رَبَّنَا وَٱجۡعَلۡنَا مُسۡلِمَيۡنِ لَكَ وَمِن ذُرِّيَّتِنَآ أُمَّةٗ مُّسۡلِمَةٗ لَّكَ﴾ پەروەردگارمان خۆت وامان لێبکە تا سەر بەرفەرمانت بین، نەوەکانمان واڕابێنە کۆمەڵێك بن لە فەرمانی تۆ دەرنەچن. ئەوان لەوکاتەدا خەریکی کاری چاك بوون، داوایان لەخودای گەورە دەکرد کەلێیان قبولٚ بکا. وەك ئیبنو ئەبی حاتەم ڕیوایەتی کردووە لە وەهبی کوڕی وەردەوە کە ئەم ئایەتەی خوێندەوە: ﴿وَإِذۡ يَرۡفَعُ إِبۡرَٰهِـۧمُ ٱلۡقَوَاعِدَ مِنَ ٱلۡبَيۡتِ وَإِسۡمَٰعِيلُ رَبَّنَا تَقَبَّلۡ مِنَّآۖ﴾ کاتێ کە ئیبراهیم و ئیسماعیل بناغەی ماڵەکەی خودایان بەرز کردەوە دەیان وت: پەروەردگارمان لێمان قبولٚ بکە، تۆ هەر خۆت زۆر بیسەرو زۆر زانای. پاشان دەگریا و دەیووت: ئەی خەلیلی ڕەحمان! تۆ بناغەی ماڵەکەی ڕەحمان بەرز دەکەیتەوە، دەترسی لەوەش کە لێت قبولٚ نەکا[2]. ئەمەیش وەك خودای گەورە باسی حاڵی خاوەنباوەڕە پاك و دڵسۆزەکان دەکا و ئەفەرموێت: ﴿وَٱلَّذِينَ يُؤۡتُونَ مَآ ءَاتَواْ﴾ ئەوانەی هەرچی لەڕێی خودا بەخشیویانە هەر دەیبەخشن لە زەکات و خێرو بێر﴿وَّقُلُوبُهُمۡ وَجِلَةٌ﴾ دڵەکانیان دەلەرزێ، واتە: دەترسن کە لێیان وەرنەگیرێ. وەك لەفەرمودەی سەحیحا هاتووە لە عائیشەوە ڕەزای خوای لێبێ لە پێغەمبەری خوداوە(ﷺ) وەك لە شوێنی خۆیدا بەو زوانە دێت. بوخاری ڕیوایەتی کردووە لە ئیبنو عەباسەوە ڕەزای خوایان لێبێ ئەڵێت: یەکەم کەسێ کە پشتوێنی لە پێشا بەستووە لە ژناندا دایکی ئیسماعیل بووە. پشتوێنێکی بەست تا شوێنەواری خۆی بسڕێتەوە لە سارە، پاشان ئیبراهیم ئەوی بە منداڵەکەیەوە ئیسماعیل هێنا کە شیری پێئەدا، تا لەلای بەیتدا داینێ لەلای دەوحەدا لەسەر زەم زەم لەلای سەرەوەی مزگەوتدا(کەعبەدا) لەو کاتەدا هیچ کەس لەمەککەدا نەبوو، ئاویشی هەر تیانبوو، ئالەوێدا داینان، تورەکەیەکی بۆدانان کە خورمای تێدا بوو. دەفرێکیش کونە یاجەوەنە کە ئاوی تێدا بوو. پاشان ئیبراهیم بەرەو دوا گەڕایەوە، دایکی ئیسماعیل شوێنی کەوت و وتی: ئەی ئیبراهیم! بۆ کوێ دەچی و ئێمەت لەو شیوەدا بەجێ هێشت کە

---

[1] القرطبي /٢/١٣٦ ص١٠٢.

[2] ابن ابی حاتم /١/٣٨٤.

هیچ کەس و هیچ شتێکی تێدانیە؟ چەند جارێ ئەمەی پێوت، بەڵام ئیبراهیم هەرلای لێنەکردەوە تا گەیشتەلای سەنیە کەنەیان دەبینی، ڕوی کردە بەیتو پاشان بەم دوعایە دەستی کرد بەپاڕانەوەو هەردوو دەستی بەرزکردەوەو وتی: ﴿رَّبَّنَآ إِنِّيٓ أَسۡكَنتُ مِن ذُرِّيَّتِي بِوَادٍ غَيۡرِ ذِي زَرۡعٍ عِندَ بَيۡتِكَ ٱلۡمُحَرَّمِ رَبَّنَا لِيُقِيمُواْ ٱلصَّلَوٰةَ فَٱجۡعَلۡ أَفۡـِٔدَةٗ مِّنَ ٱلنَّاسِ تَهۡوِيٓ إِلَيۡهِمۡ وَٱرۡزُقۡهُم مِّنَ ٱلثَّمَرَٰتِ لَعَلَّهُمۡ يَشۡكُرُونَ﴾[1] پەروەردگاری هەموولامان! من لەناو شوێنێکی قاقڕ لەپەنا ماڵی پیرۆزت یەکێ لە منداڵەکانم نیشتەجێ کرد، پەروەردگارمان بۆئەوە کە نوێژ بکەن، دەسا تۆش کارێ وابکە خەڵك بەدڵ خۆشی بوێن، لە بژێویش بەشیان بدە، بەڵکو شوکری تۆبکەن. ئیتر دایکی ئیسماعیل شیری ئەدا بە ئیسماعیل و لەو ئاوەی دەخواردەوە، تا هەرچی ئاو بوو لەدەفرەکەدا تەواو بوو، خویشی و کوڕەکەیشی تینویان بوو، سەیری منداڵەکەی دەکرد وەك لە گیانداندا بێت وابوو، ڕۆشت و پێی ناخۆش بوو سەیری بکا، سەفای بینی کەنزیکترین کێو بوو لەو شوێنەدا لێی چووە سەری و پاشان ڕووی لە شیوەکە کرد، سەیری دەکرد ئایا کەسێ هەیە تا چاوی پێی بکەوێ، کەسی نەبینی، لەسەفا هاتە خوارەوە تا گەیشتە شیوەکە، کراسەکەی بەرز کردەوە، پاشان وەك کەسێك بەپەلە بڕواشیوەکەی بڕی، تا گەیشتە مەروە لەسەری وەستا، سەیری کرد ئایا کەسێ هەیە تا چاوی پێی بکەوێ، کەسی نەبینی. حەوت جار بەوکارە هەڵسا ئیبنو عەباس ئەڵێت: پێغەمبەر(ﷺ) فەرموی: لەبەر ئەوەیە خەڵکی پەلەیان کردووە(سعی)لە نێوانیاندا. کاتێ کەچووە سەری مەروە گوێی لە دەنگێ بوو، بەخۆی ووت: بێ دەنگ بە، پاشان گوێی گرت، دیسان گوێی لێی بوو، وتی: گوێم لێت بوو، ئەگەر توانای یارمەتیت هەیە، لەپڕ فریشتەیەك لەوشوێنەی زەمزەمدا پەیدا بوو، بە پاژنەی دەگەڕا، یان وتی: بەهەردوو باڵەکەی. تا ئاو دەرکەوت: وای دەکرد دەوری بگرێ بەدەستی ئاوای لێدەکرد، دەیویست شوێنی بۆبکا لەوجێگەی خۆیدا، کەچی ئاوەکە هەر هەڵدەقوڵا دوای ئەو چاڵبۆکردنەش. ئیبنو عەباس ئەڵێت: بەربەزەیی خودا کەوێ دایکی ئیسماعیل ئەگەر وازی لە زەمزەم بهێنایە یان فەرموی: ئەگەر شوێنی نەکردایە بۆ ئاوەکە، زەم زەم دەبوو بەکانیەکی ئاو لەبەر ڕۆشتوو. وتی: ئاوی خواردەوەو شیریشیدا بە منداڵەکەی،فریشتەکە پێی ووت: ترسی لەناوچوونت نەبێ، بێگومان ئالێرەدا ماڵێکی خودا هەیە، ئەم منداڵە و باوکی دروستی دەکەن. خودا خەڵکی خۆی لەناو نابات. ئەوکاتە بەیت لەزەوی بەرز بوو وەك تەپۆڵکەیەك، لافاو لێی ئەدا لای ڕاست و لای چەپی ڕادەماڵی. هەربەو جۆرە بوو تا دەستەیەك لە جورهم بەلایاندا تێپەڕەی، یان خێزانێك لە جورهم لە ڕێگەی کەدائەوە لەخواری مەککەوە دابەزین، هەندێ باڵندەیان بینی بەوێدا دەسوڕانەوە. وتیان: ئەم باڵندانە بەسەر ئاودا دەسوڕێنەوە، ئەوەی

---

[1] إبراهيم ٣٧.

ئێمە شارەزای بێن لەو شیوەدا ئاو نەبووە، کەسێ یان دووکەس بنێرن، کاتێکیان زانی ئەوە ئاوە، گەڕانەوەو هەواڵی ئەو ئاوەیان پێدان، بەرەو ئاوەکە چوون وتی: دایکی ئیسماعیل لەلای ئاوەکەدا بوو، وتیان: ڕێمان پێئەدەیت لەلای تۆدا ئێمەش دەبەزین؟ وتی: بەڵێ بەلاَم هیچ هەقێکتان بەسەر ئەو ئاوە نیە کە لامانە، وتیان: بەڵێ. ئیبنو عەباس ئەڵێت: پێغەمبەر (ﷺ) فەرموی: کە دایکی ئیسماعیل ئەوەی دی، حەزی لەئاوەدانی دەکرد، ئەوانیش دابەزین و ناردیان بۆلای کەس و کاریان و ئەوانیش لەگەڵیان مانەوە، کەسی وایان تێدابوو خاوەن خێزان و ماڵ و منداڵ بوو. ئەم منداڵە بووە لاوو لەوان فێری زمانی عەرەبی بوو، ڕێزیان لێدەگرت و سەرنجیان ڕاکێشابوون کە گەورە بوو ژنێکیان لە خۆیان کردە هاوسەری. دایکی ئیسماعیل کۆچی دوای کرد. ئیبراهیم هات تا بەجێماوەکانی خۆی بەسەر بکاتەوە. ئیسماعیلی نەدی. لە ژنەکەی پرسی دەربارەی، ئەویش وتی: دەرچووە شتێکمان بۆ پەدا بکا. پاشان دەربارەی گوزەران و حاڵیان لێی پرسی، وتی: ئێمەش مرۆڤین، ئێمە زۆر لەتەنگانە و ناڕەحەتییان، بێزاری خۆی بۆ دەربڕی. ئیبراهیم وتی: کاتێ مێردەکەت هاتەوە سەلامی پێبگەیەنەو پێی بڵێ: لاشیپانی دەرگاکەی بگۆڕێت. کاتێ کە ئیسماعیل گەڕایەوە، وەك ئەوە هەستی شتێکی کردبێ وتی: ئایا هیچ کەسێ هاتۆتە لاتان؟ وتی: بەڵێ، پیاوێکی بەتەمەن هاتە لامان، ئاواو ئاوا بوو، دەربارەی تۆ لێی پرسین منیش بۆم باس کرد، لێی پرسیم گوزەرانتان چۆنە؟ منیش بۆم باسکرد کە زۆر لە ناڕەحەتی و تەنگانەداین ئیسماعیل وتی: ئایا هیچ ڕاسپاردەیەکی پێکردی؟ وتی: بەڵێ، فەرمانی پێکردم کەسەلامت پێبگەیەنم و دەیوت: لاشیپانی دەرگاکەت بگۆڕی، وتی: ئەوە باوکم بووە، فەرمانی پێداوم کە لێت جیاببمەوە، بچۆرەوە لای کەس و کارت، تەلاَقی داو ژنێکی تری لێخواستن. چەندێ خودا ویستی لێبوو ئیبراهیم مایەوە پاشان هاتەوە بۆلایان دیسان ئیسماعیلی نەدی، چوە لای خێزانەکەی و دەربارەی ئیسماعیل لێی پرسی، وتی: چوەتە دەرەوە شتێکمان بۆ پەیدا بکا، ئیبراهیم وتی: ئێوە چۆنن؟ پرسیاری دەربارەی ژیان و حاڵیانی لێکرد، ژنەکە وتی: ئێمە زۆر باشین و ژیانمان خۆشە و سوپاسی خودای مەزنی کرد، وتی: چی دەخۆن؟ ژنەکە وتی: گۆشت دەخۆین، وتی: ئەی خواردنەوەتان چیە؟ وتی: ئاوە، ئیبراهیم وتی: ئەی خودایە! پیت و بەرەکەت بخەرە گۆشت و ئاویان. پێغەمبەر(ﷺ)فەرموی: لەو سەردەمەدا دانەوێڵەیان نەبوو، ئەگەر بیان بوایە دوعای بۆ دەکردن تێیدا، کە خودا پیت و بەرەکەتی تێبخات. جا ئەم گۆشت و ئاوە هەردووکیان بەتەنیا بۆ کەس مایەی لەشساغی نیە بۆ خەڵکی مەککە نەبێت. ئیبراهیم وتی: کاتێ هاوسەرەکەت هاتەوە سەلامی پێ بگەیەنە، فەرمانی پێبدە لاشیپانی دەرگاکەی قایم بکات، کاتێ ئیسماعیل هاتەوە، وتی: ئایا هیچ کەسێ هاتۆتە لاتان؟ ژنەکە وتی: بەڵێ، پیاوێکی گەورەی شێوە شیرین هاتە لامان، هات بەوەسفیا، دەربارەی تۆ لێی پرسیم منیش بۆم باسکرد، پرسیاری لێکردم کە ژیانمان چۆنە؟ منیش بۆم باسکرد

کە زۆر چاکین، ئیسماعیل وتی: هیچ ڕاسپێریەکی کردی؟ وتی: بەڵێ، ئەو سەلامی لێکردی فەرمانیشی پێکردویت کە لاشیپانی دەگاکەت قایم بکەی. وتی: ئەوە باوکم بووە تۆ لاشیپانی دەرگاکەی فەرمانی پێداوم کەبت هێڵمەوە. پاشان ئەوەی خودا ویستی لێبێ لەلایان نەمایەوە، واتە: ماوەیەك بەجێی هێشتن. پاشان دوای ئەوە هاتەوە، ئیسماعیل خەریکی چاکردنی تیرێکی خۆی بوولە ژێر دەوحەدا لە نزیکی زەم زەمدا کاتێ کەچاوی پێی کەوت لەبەری هەڵساو ئەوەی باوك بۆ کوڕی دەکا و ئەوەیش کوڕ بۆ باوکی دەکا کردیان. پاشان وتی: ئەی ئیسماعیل خودا فەرمانی پێکردووم بە شتێ، ئیسماعیل وتی: ئەوەی پەروەردگارت فەرمانی پێداوی بیکە، وتی: هاوکاریم دەکەی؟ ئیسماعیل وتی: بێگومان هاوکاریت دەکەم، وتی: پەروەردگارم فەرمانی پێکردوم کە لێرەداماڵێك دروست بکەم، هێمای کرد بۆ تەپۆڵکەیەکی بەرز و ئەوەی بەدەوری دایە. وتی: ئالەوێدا بناغەی ماڵی خودایان بەرز کردەوە. ئیسماعیل بەردی دەهێنا و ئیبراهیمیش دروستی دەکرد، تا ئەو کاتەی خانووەکە بەرز بووەوە، ئینجا ئیسماعیل ئەو بەردەی هێناو بۆی داناو لەسەری وەستا، ئەو دروستی دەکردو ئیسماعیلیش بەردی ئەدا بەدەستیەوە هەردووکیان دەیان ووت: ﴿رَبَّنَا تَقَبَّلۡ مِنَّآۖ إِنَّكَ أَنتَ ٱلسَّمِيعُ ٱلۡعَلِيمُ﴾ پەروەردگارمان لێمان قبوڵ بکەی، تۆ هەر بۆخۆت زۆر بیسەرو زۆر زانای. وتی: هەربەو جۆرە خەریکی دروستکردنی بوون تا بەدەوری بەیتا دەسوڕانەوەو دەیان ووت: ﴿رَبَّنَا تَقَبَّلۡ مِنَّآۖ إِنَّكَ أَنتَ ٱلسَّمِيعُ ٱلۡعَلِيمُ﴾ پەروەردگارمان لێمان قبوڵ بکەی، تۆ هەربۆخۆت زۆر بیسەر و زۆر زانای.

**باسی دروستکردنی کەعبە لەلایەن قوڕەیشەوە دوای ئیبراهیمی خەلیل بەماوەیەکی دورو درێژ، پێش ڕەوانەکردنی پێغەمبەر(ﷺ) بە پێنج ساڵ**

پێغەمبەری خودا(ﷺ) لە دروستکردنی کەعبەدا بەردی لەگەڵا دەگواستنەوە لەو کاتەدا تەمەنی سی و پێنج ساڵ بوو. موحەمەدی کوڕی ئیسحاق کوڕی یەسار لە سیرەتەکەیدائەڵێت: کاتێ تەمەنی پێغەمبەری مەزن گەیشتە سی و پێنج ساڵ، قوڕەیشیەکان کۆبوونەوە تا کەعبە دروست بکەنەوە، زۆر بەلایانەوە گرنگ بوو دروستی بکەنەوە، بەڵام دەترسان لە ڕوخانی، دیوارەکانی بەئەندازەی باڵا بەرز بوو، دەیان ویست بەرزی بکەنەوەو بەچاکی سەری بگرنەوە، چونکە چەند کەسێ گەنجینەکەی کەعبەیان دزی بوو کە لەناو بیرێکدا بوو لەناو کەعبەدا ئەو کەسەی گەنجینەکەی لا دۆزرایەوە ناوی دوەیك بوو کە مەولای بەنی مولەیحی کوڕی عەمر بوولە خوزاعە قوڕەیشیەکان دەستیان بڕی. بەڵام هەندێ لەخەڵکی ڕایان وابوو کە چەند کەسێ دزیویانە و لەلای دوەیك دایان نابوو. دەریا کەشتیەکی ڕامالی بوو بۆ جددە کەشتیەکە هی بازرگانێکی ڕۆمی بوو، تێك شکابوو، تەختەکەیان هێناو ئامادەیان کرد تا سەری کەعبەی پێبگرن، لەمەککەدا پیاوێکی دارتاشی قیبتی لێبوو، لەسەر ئەوان چاکردنەوەی

تەختەکەی گرتە ئەستۆی خۆی، مارێك هەبوو لەبیرەکەدا هاتە دەرەوە، هەرچی دیاریەك ئەو ڕۆژە بهێنرایە لەوێ دادەنرا، ئەم مارە لەسەر دیواری کەعبە خۆی مەڵاس دابوو، لەبەر ئەوە لێی دەترسان،چونکە هەرکەسێ لێی نزیك بوایەتەوە مەکێن دەجوولآیەوە و خۆی بائەدا و دەمی دەکردەوە،ئەوانیش زۆر لێی دەترسان[1]. ڕۆژێك ئەو مارە دەمی لەسەر دیواری کەعبە بوو، وەك جارانی پێشوو، خودا باڵندەیەکی نارد هەڵی گرت و بردی، قورەیش وتیان: ئێمە دەخوازین کە خودای مەزن لێمان ڕازی بێ لەوەی ویستمان پێی هەڵسین، هۆکاری چاکمان هەیە و تەختەشمان هەیە و خودایش لەمارەکە پاراستنی، کاتێ کە هاتە سەر ئەوە بیڕوخێنن و دروستی بکەنەوە، ئەبو وەهبی کوڕی عەمری کوڕی عائیزکوڕی عەبدی کوڕی عیمرانی کوڕی مەخزوم، بەردێکی لە کەعبە هەڵگرت لەدەستی کەوتە خوارەوە، بەردەکەی گەڕاندەوە شوێنی خۆیی و وتی: ئەی خەڵکی قورەیش! لە دروستکردنیدا هیچ ماڵێکی خۆتانی تیا خەرج مەکەن پاك نەبێ، ماڵێ لەمەقی داوێن پیسیدا وەرگیرابێ مەیخەنە ناوی، مامەڵەی سوذ خۆریشی تێمەخەن، وە ماڵێکیش بەناهەق لە خەڵکی وەرگیرابێ هەر خەرجی مەکەن تێیدا. ئیبنو ئیسحاق ئەڵێت: خەڵکی دەڵێن: ئەمە قسەی وەلیدی کوڕی موغەیرەی کوڕی عەبدلالآی کوڕی عەمری کوڕی مەخزومە[2]. وتی: پاشان قورەیش کەعبەیان بەش بەش کرد، کەرتی دەرگایان دا بەبەنی عبدی مەناف و زوهرو نێوانی ڕوکنی ئەسوەد و ڕوکنی یەمانی دا بەبەنی مەخزوم و چەند تیرەیەکی عەرەب کە خۆیان دایە پاڵ ئەوان. پشتی کەعەبەشیان دا بەبەنی جەمەح و سەهم، وە کەرتی بەردەکەشیان دا بەبەنی عبدوداری کوڕی قوسەیی و بەنی ئەسەدی کوڕی عەبدلعوزای کوڕی قوسەی، وە بەنی عەدی کوڕی کەعب کوڕی لوئەی کە حەتیمە پاشان خەڵکی لە ڕوخانەکەی ترسان و لێی دورکەوتنەوە. وەلیدی کوڕی مەغەیەرە وتی: من لە پێش ئێوە دەست بەڕوخانی دەکەم. پاشان پاچی هەڵگرت و لەسەری وەستا وتی: ئەی خودایە! نیازی خراپم نیە، ئەی خودایە! جگە لەچاکە هیچ نیازێکی ترمان نیە. پاشان لەلای هەردوو ڕوکنەکەوە دەستی کرد بە ڕوخاندنی، خەڵکی ئەو شەوە چاوەڕوانیان کردو وتیان، دەخایەنین ئەگەر توشی بوو، ئەوا ئێمە هیچی تری لێناڕوخێنین و وەك خۆی لێدەکەینەوە کە چۆن بووە، خۆ ئەگەر توشی هیچیش نەهات، ئەوە خودا لەوە ڕازیە کردومانە. وەلید ئەو شەوە هەربەردەوام بوو لەسەر کارەکەیی و هەر خەریکی ڕوخاندن بوو، خەڵکیش لەگەڵی دەیان ڕوخاند، تا هەموویان ڕوخاند و گەیشتنە سەر بناغە، ئەو بناغەی کە ئیبراهیم لێی دابوو سەلامی خوای لێبێ دەستیان برد بۆ چەند بەردێکی سەوز وەك دوان چوبن بەناو یەکدا، وتی: هەندێ لەوانەی

---

[1] کیف سرقوا کنز الکعبة ما دامت الحیة قد کانت فی هذا الحال؟ واتە: چۆن ئەو گەنجینەی کەعبەیان دزی کە ئەو مارە بەو شێوەیە بووە؟

[2] ابن هاشم/١/٢٠٤ ص١٠٤.

فەرمودە ڕیوایەت دەکەن، بۆیان گێڕامەوە کە پیاوێ لە قورەیشیەکان لەو کەسانەی کە دەیان ڕوخاند نوێڵێ بان پیکێکی بردە ناو دووبەرد بۆئەوەی یەکێکیان هەڵکەنێ کاتێ کەبەردەکەی جوڵاند. مەککە هەمووی کەوتە جوڵە. ئیتر وازیان لەو بناغەیە هێنا[1].

**نـــاکۆکی لەســـەر بـــەردە ڕەش و ( الحجـــر الاســـود ) دادوەری موحەمـــەدی کـــوڕی عبداللـــە( ﷺ ) بەدادوەریەکی ڕێك و ڕاست بۆیان**

ئیبنو ئیسحاق ئەڵێت: پاشان هۆزەکانی قورەیش بەردیان کۆکردەوە بۆ دروستکردنی، هەموو بۆخۆی بەردی کۆدەکردەوە. پاشان دەستیان دایە دروستکردنی تا دیوارەکە گەیشتە شوێنی ڕوکنەکە واتە: بەردە ڕەشەکە کەوتنە کێشە تێیدا، هەر هۆزێك بۆخۆی دەیویست بەردەکە بخاتەوە جێی خۆی بەتەنیا، تا وای لێهات کەوتنە کێشەو ناکۆکی و خۆیان بۆ شەڕ ئامادەکرد، بەنو عبددارد‌ەفرێکیان هێناکە پڕبوو لەخوێن، پاشان پەیمانیان لەگەڵ یەکتر بەست کە خۆیان و بەنی عەدی کوڕی کەعبی کوڕی لوئەی لەسەر ئەوە بمرن. دەستیان خستە ناو ئەو خوێنە کە لەناو ئەو دەفرەدا بوو ناویان نا (لقعة الدم) قورەیش بەو شێوەیە تا چوار شەو یان پێنج شەو مانەوە. پاشان لەمزگەوت کۆبوونەوە، کەوتنە ڕاوێژو وتووێژکردن، هەندێ لەوانەی کە ئەهلی ڕیوایەتن وتویان کە ئەبو ئومەیەیی کوڕی موغەیرەی کوڕی عبدوڵلای کوڕی عەمری مەخزومی، لەو سەردەمەدا لەهەموویان بەتەمەن تر بوو لەناو قورەیشدا. وتی: ئەی خەڵکی قورەیش! لەناو خۆتاندا بڕیار بدەن لەسەر ئەوەی کەناکۆکن لە سەری، هەرکەسێ لەم دەرگاوە هاتە ناو ئەم مزگەوتە دادەوەری بکا لە نێوانتاندا دەربارەی، ئەوانیش ڕازی بوون، یەکەم کەسێ کەهاتە ژوورەوە پێغەمبەری خودا( ﷺ ) بوو کاتێ کەچاویان پێی کەوت وتیان: ئەمە ئەمینەو پێی ڕازین، ئەمە موحەمەدە( ﷺ ) کاتێ کەگەیشتنە دانانی بەردەکە هەواڵیان پێدا، پێغەمبەر( ﷺ ) فەرموی: پۆشاکێکم بۆبێنن، بۆیان هێنا، بەردە ڕەشی هەڵگرت و بەدەستی خۆی داینا تێیدا، پاشان فەرموی: هەرهۆزێك چمکێکی ئەم پۆشاکە بگرێ پاشان هەموو بەرزی بکەنەوە، ئەوانیش بەرزیان کردەوە تا نزیکی شوێنەکەیان کردەوە، پێغەمبەر( ﷺ ) بەدەستی خۆی هەڵی گرت و لەجێی خۆی داینایەوە و پاشان دیواریان لەسەرکرد، قورەیشیەکان لە پێش هاتنی نیگادا بۆی ناویان لێنابوو ئەمین دوای ئەوە کەخانوەکەیان تەواوکرد بەو شێوەی کە خۆیان ویستیان زوبەیری کوڕی عەبدولموتەلیب دەربارەی ئەو مارەی کی قەوڕەیش ئەترسان لێی لە دروستکردنی کەعبەدا وتی:

| | |
|---|---|
| عجبت لما تصويت العُقاب | إلى الثعبان وهي لهااضطراب |
| وقد كانت يكون لهاكشيش | و أحياناً يكون لها وِثاب |

---

[1] ابن هاشم/١/٢٠٧.

إذا قمنا إلى التأسيس شدَّت تُهيِّبنا البناء وقد تُهاب

فلماأن خشينا الزَّجرَ جاءت عقاب تتلئب لها انصباب

فضمتها إليها ثم خلت لنا البنيان ليس له حجاب

فقمنا حاشدين إلى بناء لنا منه القواعدُ و التراب

غداة نرفع التأسيس منه وليس على مسوِّينا ثياب

أعز به المليك بني لؤي فليس لأصله منهم ذهاب

وقدحشدت هناك بنوعدي و مرّة قد تقدمها كلاب

فبوأنا المليك بذاك عزًّا عند الله يُلتمس الثواب

**عەبدوڵلای کوڕی زوبەیر کەعبەی دروستکردەوەبەوشێوەی کە پێغەمبەری خودا(ﷺ) ویستویەتی**

ئیبنو ئیسحاق ئەڵێت: کەعبەی پیرۆز لەسەردەمی پێغەمبەردا (ﷺ) هەژدە زیراع بووە. ئەوسا بە قەباتی دادەپۆشرا، پاشان بە بورود دادەپۆشرا. وە یەکەم کەسێ کەبەدەبیاج داپۆشی حەجاجی کوڕی یوسوف بوو[١]. منیش دەڵێم: هەر بەوشێوەیە کەعبەی پیرۆز مایەوە،تا لەسەرەتای میرنشینی عەبدوڵلای کوڕی زوبەیردا سوتا. دوای ساڵی شەست لەکۆتایی فەرمان ڕەوایی یەزیدی کوڕی مەعاویەدا، کاتێ کەگەمارۆی عەبدوڵلای کوڕی زوبەیریاندا لەوکاتەدا عەبدوڵلای کوڕی زوبەیر ڕوخاندی و خستیەوە سەر زەوی لەسەر بناغەکەی ئیبراهیم سەلامی خوای لێبێ دروستی کردەوە بەردەکەی تیا دانایەوە، دەرگایەکی لە ڕۆژ هەڵات و دەرگایەکی لە ڕۆژئاواوە چەسپابوون بەزەمینەوە بۆ دانا. وەك چۆن لەپوریەوە عائیشەی دایکی مسوڵمانان ڕەزای خوای لێبێ ئەوەی بیستبوو لە پێغەمبەری خوداوە(ﷺ)، لەفەرمانڕەوای هەر بەو شێوەیە مایەوە تا ئەو کاتەی کە حەجاج کوشتی. حەجاج بە فەرمانی عەبدولمەلیکی کوڕی مەروان ماڵی خودای وەك جاری پێشوو لێ کردەوە، موسلیم ڕیوایەتی کردووە لە سەحیحەکەیدا لە عەتاوە ئەڵێت: کاتێ ماڵی خودا لەسەردەمی یەزیدی کوڕی مەعاویەدا سوتا کاتێ کە خەڵکی شام هێرشیان کردە سەری، ئەوەی کە ڕوی داو بەسەری هات عەبدوڵلای کوڕی زوبەیر وازی لێهێنا تا کاتێ خەڵکی هاتن بۆ حەج ویستی هەڵیان بنێت و کۆیان بکاتەوە بۆسەر خەڵکی شام، کاتێ کەخەڵکەکە هاتن وتی: ئەی خەڵکینە ! بۆچونی خۆتانم بۆباس بکەن دەربارەی کەعبە ئایا بیڕوخێنم یان ئەوەی تێك چووە چاکی بکەمەوە؟ ئیبنو عەباس ئەڵێت: من ڕاوبۆچونی خۆمم هەبوو دەربارەی، من ڕام وابوو ئەوەی تێکچووە چاك بکرێتەوە واز لەبەیت و ئەو بەردانە بێنی لەسەرەتای مسوڵمان بوونی خەڵکەوە، لەسەرەتای هاتنی پێغەمبەرەوە(ﷺ) بوون عەبدوڵلای کوڕی زوبەیر وتی:

---

[١] ابن هاشم/١/٢١١.

ئەگەر کەسێکمان ماڵەکەی بسوتێ بە تازەکردنەوەی نەبێت ڕازی نابێت خۆ ئەمە ماڵی پەروەردگاریشتانە، من سێ ڕۆژ لەسەر یەك(ئیستخارەی) خۆم دەکەم، ئەوسا بڕیاری خۆم ئەدەم. کەسێ ڕۆژ تێپەڕی، ڕای هاتە سەر ئەوە کە بیڕوخێنێ، خەڵکی دەترسان لەوەی کە یەکەم کەس دەچێتە سەری توشی بەڵایەك ببێ لەئاسمانەوە، تا پیاوێك چووە سەری، بەردێکی لێخستە خوارەوە، کاتێ کەنەیان دی هیچی توش ببێ، ئەوانیش دەستیان پێکردو هەڵیان تەکاند تا گەیاندیانەوە سەرزەوی، عەبدوڵڵای کوڕی زوبەیر کۆڵەکەی هێناو پەردەی پیادان تا دیوارەکانی بەرز بوەوە، عەبدوڵلا وتی: من بیستومە لە عائیشەوە ڕەزای خوای لێبێ دەیوت: پێغەمبەری خودا(ﷺ) فەرمویەتی: ئەگەر خەڵکی لە خوانەناسیەوە نزیك نەبونایە، ئەوەندەش پارەم نیە بۆ ئەم ڕۆژەم کەپێی دروست بکەمەوە ئەگینا پێنج باڵم لەلای(حجر)ەوە دەخستە سەری، دەرگایەکم بۆ دروستدەکرد کە خەڵکی لێوەی بچنە ژورەوەو دەرگایەکیش کە لێوەی بچنە دەرەوە، ئینجا وتی: من ئەمڕۆ ئەوەندەم هەیە خەرجی بکەم، لە خەڵکیش ناترسم، ئیتر پێنج باڵی لای(حجر)ی ئیسماعیل خستە سەری و هەڵی کەند تا بناغەکەی دەرکەوت، خەڵك بینیان و لەسەر ئەوە دیواری دروستکرد، درێژی کەعبە هەژدە گەزبوو، کاتێ پانتاییەکەی زیادکرد بەرزیەکەی بەکەم دەهاتە پێش چاو بۆیە دە گەزی خستە سەر بەرزیەکەی، دوو دەرگاشی بۆکرد، یەکێکیان بۆ چوونە ژورەوە و ئەوی تریان بۆ هاتنە دەرەوە کاتێ کە ئیبنو زوبەیر شەهید کرا حەجاج نوسی بۆ عەبدولمەلیکی کوڕی مەروان و هەواڵی دایە و پێی وت: کە عەبدوڵڵای کوڕی زوبەیر بناغەی(بەیتی) داناوە پرس و ڕای کردوە بە پیاو ماقوڵانی مەککە. عەبدولمەلیك وتی: ئێمە لەگەڵ کاری نادروستی عەبدوڵڵای کوڕی زوبەیردا نین، ئەوەی لەبەرزیەکەی خستویەتیە سەری ئەوە بڕیاری لەسەر بدە، ئەوەیش لەسەر حجر خستویەتیە سەری وەك خۆی لێبکەرەوە و دەرگایەکەش داخە کەکردویەتیەوە، ئیتر حەجاج هەڵی وەشاندەوەو وەکو خۆی لێکردەوە[١]. نەسائیش ڕیوایەتی کردووە لێیەوە بە مەرفوعی[٢]، بەڵام بەسەرهاتەکەی باس نەکردوە فەرمودە پشتگیری لەو کارەی عەبدوڵڵای کوڕی زوبەیر کردووە ڕەزای خوای لێبێ ئەوە بوو کە پێغەمبەری خودا(ﷺ) پێی خۆش بوو بەڵام ترسی لەوە هەبوو کە هەندێ لەو خەڵکە تازە مسوڵمان و لە کوفرەوە نزیك بوون. عەبدولمەلیکی کوڕی مەروان ئاگاداری ئەوە نەبوو، کاتێ کەبۆی دەرکەوت کە عائیشە ڕەزای خوای لێبێ ڕیوایەتی کردووە لە پێغەمبەری خوداوە(ﷺ) وتی: پێمان خۆش بوو وازمان لێبهێنایە و بمایەتەوەو تێکمان نەدایە، وەك موسلیم ڕیوایەتی کردووە لە عەبدوڵڵای کوڕی عوبەیدەوە وتی: کرا بە نوێنەر بۆ لای عەبدولمەلیکی کوڕی مەروان لەکاتی جێنشینیدا

---

[١] مسلم/٢/٩٧٠ ص١٠٦.

[٢] النسائی/٢/٥١٨ سه حیحه.

عەبدولمەلیك وتی: ئەی ئەبو خوبەیب! وانازانم عەبدوڵلای کوڕی زوبەیر لە عائیشەی بیستبێ، کە وتویەتی لە عائیشەم بیستووە. حاریس وتی: بەڵێ، من لێمەوە بیستووە،وتی: چیت لێبیستوە وتویەتی؟ وتی: عائیشە ڕەزای خوای لێبێ وتی: پێغەمبەری خودا(ﷺ) فەرمویەتی: بێگومان هۆزەکەت کەمتەرخەمیان کردووە لە دروستکردنەوەی ئەم ماڵەدائەگەر لە بت پەرستیەوە نزیك نەبونایە ئەوەی ئەوان وازیان لێهێناوە تەواوم دەکرد ئەگەر هۆزەکەت دوای من بۆیان ڕەخسابا دروستی بکەنەوە، ساوەرە ئەوەی ئەوان بەجێیان هێشتووە نیشانت بدەم. کە بینی نزیکەی حەوت باڵ دەبوو. وەلیدی کوڕی عەتا کە یەکێکە لەوانە ڕیوایەتی کردووە ئەمەی لێ زیاد کردووە. پێغەمبەر(ﷺ) فەرمویەتی: وە دوو دەرگام لەسەر تەختی زەوی بۆ دادەنا: یەکێکیان لە ڕۆژهەڵاتەوە ئەوی تریان لە ڕۆژئاواوە، ئایا دەزانی هۆزەکەت بۆچی دەرگاکەیان بەرز کردبوەوە؟ وتی: نەخێر، فەرموی لەبەر دەرخستنی تواناو دەسەلاتی خۆیان، تا کەسێ نەچێتە ناوی کە خۆیان ئارەزویان لێی نەبێ، کاتێ پیاوێ بیویستایە بچێتە ناوی، مۆڵەتیان ئەدا تا سەردەکەوت تا کاتێ نزیك بوو بچێتە ناوی پاڵیان پێوە دەنا و دەکەوت. عەبدولمەلیك وتی: وتم بە حاریس: تۆ لێت بیست ئاوای وت؟وتی: بەڵێ،عەبدولمەلیك ماوەیەك گۆچانەکەی لە زەویدا و پاشان وتی: پێم خۆش بوو وازم لێبهێنایە لەوەی کە گرتویەتیە ئەستۆی[1].

### حەبەشیەك کەعبەی پیرۆز دەڕوخێنێ لە نزیکی هاتنی قیامەتا

لە هەردوو سەحیحەکەدا هاتووە لە ئەبو هورەیرەوە ئەڵێت: پێغەمبەری خودا(ﷺ) فەرمویەتی: پیاوە قۆڵ باریکەکەی حەبەشە کەعبە دەڕوخێنێ. بوخاری و موسلیم ئەم فەرمودەیان ڕیوایەت کردووە[2]. وە لە ئیبنو عەباسەوە لە پێغەمبەرەوە(ﷺ): وەك ئەوە ئاگام لێیەتی پیاوێکی ڕەشە پێکانی بڵاو کردوەتەوە بەرد بە بەرد هەڵی دەتەکێنێ. بوخاری ڕیوایەتی کردووە[3]. ئیمامی ئەحمەد ڕیوایەتی کردووە لە موسنەدەکەیدا لە عەبدوڵلای کوڕی عەمری کوڕی عاسەوە ڕەزای خوای لێبێ وتی: بیستم لە پێغەمبەری خودا(ﷺ) ئەیفەرمو: پیاوە قۆڵ باریکەکەی حەبەشە کەعبە دەڕوخێنێ و خشڵەکەی تاڵان دەکاو پۆشاکەکەی لێدەکاتەوە، وەك ئەوەیە کەمن سەیری دەکەم، سەر ڕوتاوەیەکی قاچ لاروخوارە، بەبێڵ و قازمەکەی لێی ئەدات[4]. (الفدع)خوار بوونەوەیە لە نێوان پێی و لاقدا، ئەمە والله أعلم لە دوای هاتنی یأجوج و مأجوجە وەك لە سەحیحی بوخاریدا هاتووە لە ئەبو سەعیدی

---

[1] مسلم/٢/٩٧١ ص١٠٦.

[2] فتح الباری/٣/٥٣٨/، مسلم/٤/٢٢٣٢.

[3] فتح الباری /٣/٥٣٨.

[4] أحمد /٢/٢٢٠.

خودەریەوە ڕەزای خوای لێبێ وتی: پێغەمبەری خودا(ﷺ) فەرموویەتی: بێگومان دوای دەرچونی یأجوج و مأجوج حەج و عەمرەی بیت دەکرێت[1].

**پاڕانەوەی ئیبراهیمی خەلیل سەلامی خوای لێبێ**

خودای گەورە باسی دوعاکەی ئیبراهیم و ئیسماعیل دەکاو سەلامی خوایان لێبێ ئەفەرموێت: ﴿ رَبَّنَا وَاجْعَلْنَا مُسْلِمَيْنِ لَكَ وَمِن ذُرِّيَّتِنَآ أُمَّةً مُّسْلِمَةً لَّكَ وَأَرِنَا مَنَاسِكَنَا وَتُبْ عَلَيْنَآ إِنَّكَ أَنتَ التَّوَّابُ الرَّحِيمُ ﴾ پەروەردگارمان! خۆت وابکەی تاسەر بەرفەرمانت بین، نەوەشمان واڕابێنە کۆمەڵێك بن لە فەرمانی تۆ دەرنەچن و ڕێو شوێنی تۆ پەرستیمان نیشان بدە و تۆبەمان لێ قبوڵ بکە، تۆی تۆبە قبوڵ دەکەی و دلۆڤانی. ئیبنو جەریر ئەڵێت: مەبەستیان ئەوە بووە کە گەردن کەچین بۆ فەرمانت، هەرگیز هیچ کەس ناکەینە شەریکت لە پەرستن و گوێڕایەڵیتاو تەنیا هەر تۆ دەپەرستین[2]. عیکرمە ئەڵێت: ﴿ رَبَّنَا وَاجْعَلْنَا مُسْلِمَيْنِ لَكَ ﴾ پەروەردگارمان! خۆت وابکە تا سەر بەرفەرمانت بین. خودای مەزن فەرموی: وام کرد﴿وَمِن ذُرِّيَّتِنَآ أُمَّةً مُّسْلِمَةً لَّكَ ﴾ نەوەشمان وا ڕابێنە کۆمەڵێك بن لەفەرمانی تۆ دەرنەچن. خودای مەزن فەرموی: وام کرد. ئەم دوعایە لەلایەن ئیبراهیم و ئیسماعیلەوە بووە،وەك خودای گەورە پێمان ڕادەگەیەنێ لەلایەن عەبدە لەخوا ترس و خاوەن باوەڕەکانەوە لەم ئایەتەدا ئەفەرموێت: ﴿وَالَّذِينَ يَقُولُونَ رَبَّنَا هَبْ لَنَا مِنْ أَزْوَاجِنَا وَذُرِّيَّاتِنَا قُرَّةَ أَعْيُنٍ وَاجْعَلْنَا لِلْمُتَّقِينَ إِمَامًا ﴾[3] ئەوانەش کەدەڵێن: ئەی پەروەردگارمان! ژن و منداڵی وامان پێببەخشە ببنە مایەی چاو ڕونیمان، بشمانکە پێشەوا بۆ خۆپارێزان. ئەم ئەندازەیە لە شەرعدا ڕێی پێدراوە، چونکە لەتەواوی خۆشەویستی بەندەکانی خودایە کە لەپشتی ئەودا کەسانێ پەیدا بن کە تەنیا خودا بپەرستن و شەریکی بۆ پەیدا نەکەن. هەر بۆیە خودای گەورە کاتێ ئەفەرموێت بە ئیبراهیم سەلامی خوای لێبێ ﴿إِنِّي جَاعِلُكَ لِلنَّاسِ إِمَامًا﴾ دەتکەم بەڕێبەری خەڵکی دونیا فەرموی: ﴿وَمِن ذُرِّيَّتِي قَالَ لَا يَنَالُ عَهْدِي الظَّالِمِينَ ﴾[4] لەنەوەکانیشم؟ فەرموی: ستەمکاران وەبەریەڵێنم ناکەون. ئەمەیش ئەوەیە کە خودای گەورە لە ئایەتێکی ترا فەرمویەتی: ﴿وَاجْنُبْنِي وَبَنِيَّ أَن نَّعْبُدَ الْأَصْنَامَ ﴾[5] من و منداڵەکانیشم لە بتپەرستی دورخەرەوە. وە لە سەحیحی

---

[1] فتح الباری /٣/٥٣١.

[2] الطبری /٣/٧٣ ص١٠٦.

[3] الفرقان ٧٤.

[4] البقرة ١٢٤.

[5] إبراهیم ٣٥.

موسلیما هاتووە لە ئەبو هورەیرەوە ڕەزای خوای لێبێ لە پێغەمبەری خوداوە(ﷺ) فەرمویەتی: کاتێ کەسێك مرد دەسبەرداری هەموو کردارێك دەبێت، جگە لە سێ شت: خێزانێکی نەبڕاوەو بەردەوام، یا زانستێك کە سودی لێببینرێت، یان منداڵێکی باشی هەبێت دوعای خێری بۆ بکات[1].

## مانای دروشمەکان (المناسك)

﴿وَأَرِنَا مَنَاسِكَنَا﴾ ڕێو شوێنی تۆپەرستیمان نیشان بدە. سەعدی کوڕی مەنسور ئەڵێت: عەتتابی کوڕی بەشیر لە خوسەیفەوە لە موجاهیدەوە ئەڵێت: ئیبراهیم وتی: ﴿وَأَرِنَا مَنَاسِكَنَا﴾ ڕێو شوێنی خوا پەرستیمان پیشان بدە. جوبرەئیل هاتە لای و بەرەو کەعبە بردی و پێی وت: ئەم بناغە بەرز بکەرەوە، ئەویش بەرزی کردەوەو بەتەواوی دروستی کردەوە، پاشان دەستی گرت و بردیە دەرەوە بەرەو سەفا، وتی: ئەمە لە دروشمەکانی خودایە من شعائر الله پاشان بردی بەرەو مەروە ووتی: ئەمەش لە دروشمەکانی خودایە، پاشان بەرە و مینا بردی، کاتێ کە لەعەقەبەدا بوو ئیبلیس لەلای درەختێکا وەستابوو، جوبرەئیل وتی: الله أکبر بکە و بەردبارانی بکە، ئەویش الله أکبری کردو بەردبارانی کرد، پاشان ئیبلیس ڕۆشت و لەلای جەمرەی ناوەڕاستا وەستا، کاتێ کە جوبرەئیل و ئیبراهیم بەوێدا تێپەڕین پێی وت: الله أکبر بکە و بەردبارانی بکە، ئەویش الله أکبری کردو بەردبارانی کرد، ئیبلیسی پیس و بەدفەڕ ڕۆیشت، ئەو بۆگەنە ویستی شتێ تێکەڵی حەج بکا، بەڵام نەیتوانی، جوبرەئیل دەستی ئیبراهیمی گرت تا گەیاندیە مەشعەری حەرام وتی: ئەوەی نیشانم دایت زانیوتە؟ سێ جار ئەمەی وتەوە، ئەویش وتی: بەڵێ[2]. ئەمە ڕیوایەت کراوە لە ئەبو میجلەز و قەتادە وە هەریەو جۆرە[3].

﴿رَبَّنَا وَابْعَثْ فِيهِمْ رَسُولًا مِّنْهُمْ يَتْلُوا عَلَيْهِمْ آيَاتِكَ وَيُعَلِّمُهُمُ الْكِتَابَ وَالْحِكْمَةَ وَيُزَكِّيهِمْ ۚ إِنَّكَ أَنتَ الْعَزِيزُ الْحَكِيمُ (١٢٩)﴾

## دوعای ئیبراهیم بۆ ڕەوانەکردنی پێغەمبەر(ﷺ)

خودای گەورە ئەفەرموێت: ﴿رَبَّنَا وَابْعَثْ فِيهِمْ رَسُولًا مِّنْهُمْ يَتْلُوا عَلَيْهِمْ آيَاتِكَ وَيُعَلِّمُهُمُ الْكِتَابَ وَالْحِكْمَةَ وَيُزَكِّيهِمْ ۚ إِنَّكَ أَنتَ الْعَزِيزُ الْحَكِيمُ﴾ پەروەردگارمان! پێغەمبەرێکی هەر لەخۆیان بۆ بنێرە، تا نیشانەکانی تۆیان بەسەردا بخوێنێتەوەو لە کتێب و کارزانی ڕایان بێنێ و لە هەڵە بێپەڵەیان کا، دەسەڵات زانی و کارزانی هەر بۆخۆیەتی. خودای مەزن باسی دوعاکەی ئیبراهیم دەکا کە داوای کرد بۆ

---

[1] مسلم /٣/١٢٥٥ ص١٠٧.

[2] سعید بن منصور /٢/٦١٥ ص١٠٧.

[3] ابن ابی حاتم/١/٣٨٧.

خەڵکی حەرەم لە خۆیان پێغەمبەرێکیان بۆ ڕەوانە بکا، واتە: لەنەوەی ئیبراهیم، ئەم دوعای ئیبراهیمە لەگەڵ ئەو بڕیارەی خودا لە پێشا دابووی یەکیان گرت لەدانانی موحەمەدا(ﷺ) بە پێغەمبەر لەناو ئەو نەخوێندەوارانەدا و بۆ خەڵکی تریش لە عەجەمیەکان لە مرۆڤ و لە جنۆکەش. مەبەستەکە لێرەدا ئەوەیە، یەکەم کەسێ ناوی بردوەو لەناو خەڵکا ئاشکرای کردووە ئیبراهیم بووە سەلامی خوای لێبێ وە بەردەوام ناوی موحەمەد(ﷺ) هەر براوە و ناوبانگی بڵاوبۆتەوە، تا ئەو کاتەی دواین پێغەمبەری نەوەی ئیسرائیل کە عیسای کوڕی مەریەم سەلامی خوای لێبێ هەڵسا وتارێکی داو ناوی هێناوە وەك خودای گەورە ئەفەرموێت: ﴿إِنِّي رَسُولُ ٱللَّهِ إِلَيۡكُم مُّصَدِّقٗا لِّمَا بَيۡنَ يَدَيَّ مِنَ ٱلتَّوۡرَىٰةِ وَمُبَشِّرَۢا بِرَسُولٖ يَأۡتِي مِنۢ بَعۡدِي ٱسۡمُهُۥٓ أَحۡمَدُ﴾[1] من پێغەمبەری خوادم بۆلای ئێوە، ئەو تەوراتە بە ڕاست دادەنێم کە لە پێش مندا هاتووە، مژدەتان لێبێ پێغەمبەرێك لەپاش من دێ ناوی ئەحمەدە. هەر بۆیە لەم فەرمودەدا فەرمویەتی: دوعاکەی باوکم ئیبراهیم و مژدەکەی عیسای کوڕی مەریەم، وە ئەفەرموێت: دایکم بینی کە ڕوناکیەکی لێوە دەرچووە کۆشکەکانی شامی پڕڕوناك بوەتەوە[2]. وتراوە: کاتێ دایکی پێیەوە دووگیان بووە لە خەویدا دیویەتی ڕوناکیەکی لێوە دەرچووە. گێڕاویەتیەوە بۆ کەس و کاری و لەناویاندا بڵاوەی کردوەو ناوبانگی دەرکردوە، ئەوەیش سەرەتایەك بووە. تایبەت کردنی شام بەدەرکەوتنی ئەو ڕوناکیە هێمایە بۆ جێگیربوونی ئاینی خوداو پێغەمبەرایەتی لە وڵاتی شامدا، هەر بۆیە لە کۆتایی دونیادا دەبێتە مەڵبەندی ئیسلام خەڵکەکەی وەهەر لەوێدا عیسای کوڕی مەریەم سەلامی خوای لێبێ دێتە خوارەوە لە دیمەشق لەلای منارە خۆرهەڵاتیە سپیەکەیەوە. وە لەهەردوو سەحیحەکەدا هاتووە: تاقمێك لەسەر هەق بەردەوام دەجەنگن و نابەزن، کەسێ بیەوێ دژایەتیان بکا، ناتوانێ زیانیان لێبدا، تا فەرمانی خوا دێت ئەوان هەروا دەمێننەوە. وە لە سەحیحی بوخاریدا هاتوە: ئەوانە لە شامن[3].

## مانای کتێب و حیکمەت

خودای گەورەئەفەرموێت: ﴿وَيُعَلِّمُهُمُ ٱلۡكِتَٰبَ﴾لە کتێب و کارزانیدا ڕایان بێنێ. یانی قورئان. ﴿وَٱلۡحِكۡمَةَ﴾یانی: سونەت، ئەمە قسەی حەسەن و قەتادە و موقاتیلی کوڕی حەیان و ئەبو مالیك وکاسانی تریشە[4]. وتراویشە: تێگەیشتنە لە ئایندا، دژایەتی لەهەردوو قسەکەدا نیە﴿وَيُزَكِّيهِمۡ﴾ لەهەڵە پاکیان دەکاتەوە. عەلی کوڕی ئەبو تەلحە لە ئیبنو عەباسەوە ئەڵێت: یانی: گوێڕایەڵی فەرمانی

---

[1] الصف ٦.

[2] أحمد /٥/٢٦٢ ص١٠٧ سە حیحە.

[3] فتح الباری/٦/٧٢١/، مسلم/٢/١٥٢٤؟

[4] ابن ابی حاتم/١/٣٩٠.

خودا﴿إِنَّكَ أَنتَ ٱلۡعَزِيزُ ٱلۡحَكِيمُ﴾ دەسەلات داری لەکارزان هەرتۆی. واتە: دەسەلات دارێکی وایە دەستە و سانی ناکا، توانای بەسەر هەموو شتێکا هەیە، کارزانە لە کردارو گفتاردا، هەموو شتێ لە جێی خۆیدا دادەنێ، لەبەر زانیاری و کارزانی و دادپەروەری خۆی.

﴿وَمَن يَرۡغَبُ عَن مِّلَّةِ إِبۡرَٰهِـۧمَ إِلَّا مَن سَفِهَ نَفۡسَهُۥۚ وَلَقَدِ ٱصۡطَفَيۡنَٰهُ فِي ٱلدُّنۡيَاۖ وَإِنَّهُۥ فِي ٱلۡأٓخِرَةِ لَمِنَ ٱلصَّٰلِحِينَ ﴿١٣٠﴾ إِذۡ قَالَ لَهُۥ رَبُّهُۥٓ أَسۡلِمۡۖ قَالَ أَسۡلَمۡتُ لِرَبِّ ٱلۡعَٰلَمِينَ ﴿١٣١﴾ وَوَصَّىٰ بِهَآ إِبۡرَٰهِـۧمُ بَنِيهِ وَيَعۡقُوبُ يَٰبَنِيَّ إِنَّ ٱللَّهَ ٱصۡطَفَىٰ لَكُمُ ٱلدِّينَ فَلَا تَمُوتُنَّ إِلَّا وَأَنتُم مُّسۡلِمُونَ ﴿١٣٢﴾﴾

## هیچ کەسێ لە ئاینی ئیبراهیم لانادات مەگەر گەوج و گەمژە بێت

خودای گەورە وەڵامی خوانەناسان ئەداتەوە لەوەی کە دایان هێناوەو دروستیان کردووە لە هاوەڵ پەیداکردن بۆ خودا بەپێچەوانەی ئاینی ئیبراهیمی خەلیل رابەری بەرەو هەق ڕۆشتوان، تەنیا پەروەردگاری دەپەرستن و هاواری لە هیچ شتێ نەدەکرد جگە لەو، تەنیا چاوتروکانێکیش شەریکی بۆ دانەناوە، دوورە پەرێزی خۆی دەربڕی لەگشت پەرستویەك جگە لە خودا، دژایەتی گەلەکەی کرد لەو بارەیەوە،بێزاری خۆی دەربارەی باوکیشی دەربڕی،وتی: ﴿يَٰقَوۡمِ إِنِّي بَرِيٓءٞ مِّمَّا تُشۡرِكُونَ ﴿٧٨﴾ إِنِّي وَجَّهۡتُ وَجۡهِيَ لِلَّذِي فَطَرَ ٱلسَّمَٰوَٰتِ وَٱلۡأَرۡضَ حَنِيفٗاۖ وَمَآ أَنَا۠ مِنَ ٱلۡمُشۡرِكِينَ﴾[1] گەلەکەم من لەو کارەتان کە شەریکتان بۆ خودای من داناوە بێزارم، وامن بەدڵپاکی ڕووم کردە ئەو کەسە کە ئاسمانەکان و زەمینی داهێناوەو لەوانە نیم کە شەریکی بۆ پەیدا دەکەن. وە خودای مەزن ئەفەرموێت: ﴿وَإِذۡ قَالَ إِبۡرَٰهِيمُ لِأَبِيهِ وَقَوۡمِهِۦٓ إِنَّنِي بَرَآءٞ مِّمَّا تَعۡبُدُونَ ﴿٢٦﴾ إِلَّا ٱلَّذِي فَطَرَنِي فَإِنَّهُۥ سَيَهۡدِينِ﴾[2] ئیبراهیم بەباوك و هۆزەکەی خۆی وت: من بێزارم لەوەی ئێوە دەیپەرستن، مەگین لەکەسێ منی دروستکردوە، کە خۆی رێگەم نیشان ئەدا. وە ئەفەرموێت: ﴿وَمَا كَانَ ٱسۡتِغۡفَارُ إِبۡرَٰهِيمَ لِأَبِيهِ إِلَّا عَن مَّوۡعِدَةٖ وَعَدَهَآ إِيَّاهُ فَلَمَّا تَبَيَّنَ لَهُۥٓ أَنَّهُۥ عَدُوّٞ لِّلَّهِ تَبَرَّأَ مِنۡهُۚ إِنَّ إِبۡرَٰهِيمَ لَأَوَّٰهٌ حَلِيمٞ﴾[3] کە ئیبراهیم داوای لێخۆشبونی بۆ باوکی خۆی کرد، تەنیا بۆ بەجێهێنانی بەڵێنێك بوو کە پێی دابوو، بەڵام کاتێ کەسور زانی دژی خودایە، ئیتر هیچ خۆی تێنەگەیاند، بێگومان ئیبراهیم زۆر لەخواترس و لەسەر خۆبوو. وە ئەفەرموێت: ﴿إِنَّ إِبۡرَٰهِيمَ كَانَ أُمَّةٗ قَانِتٗا لِّلَّهِ حَنِيفٗا وَلَمۡ يَكُ مِنَ ٱلۡمُشۡرِكِينَ ﴿١٢٠﴾ شَاكِرٗا لِّأَنۡعُمِهِۚ ٱجۡتَبَىٰهُ وَهَدَىٰهُ إِلَىٰ صِرَٰطٖ مُّسۡتَقِيمٖ ﴿١٢١﴾

---

[1] الانعام ٧٨-٧٩.

[2] الزخروف ٢٦-٢٧.

[3] توبة ١١٤.

وَءَاتَيْنَٰهُ فِي ٱلدُّنْيَا حَسَنَةً وَإِنَّهُۥ فِي ٱلْأٓخِرَةِ لَمِنَ ٱلصَّٰلِحِينَ ﴾[1] ئیبراهیم پێشەوایەکی بەرەو هەق چوو بوو، بەرفەرمانی خودا بوو، لە ڕیزی ئەوانە نەبوو کە شەریك بۆ خودا دادەنێن، چاکەی خودای لەبەر چاو بوو، خودایش بۆخۆی هەڵی بژاردو شارەزای ڕێگەی ڕاستی کرد، لەدونیا بەهرەمان دایە و لەو دونیاش لە ڕیزی چاکاندایە. هەربۆیە خودای مەزن ئەفەرموێت: ﴿وَمَن يَرْغَبُ عَن مِّلَّةِ إِبْرَٰهِۦمَ ﴾ چ کەسێکی واهەیە ئاینی ئیبراهیم بنێتە لاوە؟ واتە: ڕوو وەرگێڕی لە ڕێگەو پەیامی ئیبراهیم و دژایەتی بکا ﴿إِلَّا مَن سَفِهَ نَفْسَهُۥ﴾ جا مەگین هەرخۆی گەوج بکا. واتە: ناهەقی لەخۆی بکا بەهۆی گەمژەیی و نەزانیەوە. واز لەهەق بێنێ و بەرەو گومڕایی بڕوات: ﴿وَلَقَدِ ٱصْطَفَيْنَٰهُ فِي ٱلدُّنْيَا ۖ وَإِنَّهُۥ فِي ٱلْأٓخِرَةِ لَمِنَ ٱلصَّٰلِحِينَ ﴾ ئێمە ئەومان لە دونیا هەڵبژاردووەو لەو دونیاشا وا لەڕیزی پیاو چاکانە. واتە: ڕێگەی کەسێ ئەگرێتە بەر کە لەدنیادا هەڵبژێراوە بۆڕێنمایی کردن و شارەزاکردنی خەڵکی هەر لەچاخی لاویدا تا ئەوکاتەی خودا کردی بەخەلیلی خۆی، ئەو لە ڕۆژی دوایشا لە پیاوچاکان و بەختەوەرانە. هەرکەسێ واز لەڕێگەی ئەو بێنێ و لەسەر ئاینی ئەو دەرچێ و ڕێگەی گومڕایی بگرێتەبەر چ گەوجیەك لەوە گەورەترە؟ یان چ تاوانێ لەوە تاوانترە؟ وەك خودای گەورە ئەفەرموێت: ﴿إِنَّ ٱلشِّرْكَ لَظُلْمٌ عَظِيمٌ ﴾[2] شەریك بۆ خودا بڕیادان ناهەقیەکی زۆر مەزنە. ئەبولعالیە و قەتادەئەڵێن: ئەم ئایەتە لەسەر جوولەکە هاتۆتە خوارەوە، ڕێبازێکیان داهێنا کەدووربوو لەڕێگەی خوداو دژایەتی ئاینی ئیبراهیمیان کرد کەلەسەری بوون[3]. ئەم ئایەتە شایەتی ئەدات لەسەر ئەو قسەیە کە ئەفەرموێت: ﴿ مَا كَانَ إِبْرَٰهِيمُ يَهُودِيًّا وَلَا نَصْرَانِيًّا وَلَٰكِن كَانَ حَنِيفًا مُّسْلِمًا وَمَا كَانَ مِنَ ٱلْمُشْرِكِينَ ﴿٦٧﴾ إِنَّ أَوْلَى ٱلنَّاسِ بِإِبْرَٰهِيمَ لَلَّذِينَ ٱتَّبَعُوهُ وَهَٰذَا ٱلنَّبِىُّ وَٱلَّذِينَ ءَامَنُوا۟ ۗ وَٱللَّهُ وَلِىُّ ٱلْمُؤْمِنِينَ ﴾[4] ئیبراهیم نە مووسایی بوو نەمەسیحی، بەڵام یەکتاپەرستێك بوو،خۆی بەخودا سپاردبوو،هیچ هاوکاری بۆ خودا پەیدا نەدەکرد، ئەو کەسانەی لەهەموو کەس لە ئیبراهیم نزیکترن، ئەوانەن کە ئەوسا شوێنی ئەکەوتن و ئەو پێغەمبەرەو ئەوانەش کە بڕوایان پێهێناوە، خودایش دۆستی هەموو خاوەنباوەڕانە. خودای مەزن ئەفەرموێت: ﴿ إِذْ قَالَ لَهُۥ رَبُّهُۥٓ أَسْلِمْ ۖ قَالَ أَسْلَمْتُ لِرَبِّ ٱلْعَٰلَمِينَ ﴾ کاتێ پەروەردگاری پێی ووت: وەرە خۆت بەخودا بسپێرە، وتی: واخۆم دایە دەستی ڕاهێنەری هەموو

---

[1] النحل ١٢٠-١٢٢.

[2] لوقمان ١٣.

[3] ابن ابی حاتم/١/٣٩٢ ص١٠٨.

[4] ال عمران ٦٧-٦٨.

دونیا. خودا فەرمانی پێداوە کە بەدڵپاکیەوە بیپەرستیّ و ملکەچ و گوێڕایەڵی بیّ. ئەویش بەشەرعی و بەقەدەریش وەڵامی ئەوەی دایەوە،خودای مەزن ئەفەرموێت: ﴿وَوَصَّىٰ بِهَآ إِبْرَٰهِـۧمُ بَنِيهِ وَيَعْقُوبُ﴾ ئیبراهیم بۆ کوڕەکانی و یەعقوبیشی ڕاسپارد، واتە: ڕاسپێری کردن بەم ئاینە،کە گەردن کەچیە بۆ خوا. یان زەمیرەکە دەگەڕێتەوە بۆ وتەکە کەئەودەقەیە خودای مەزن ئەفەرموێت: ﴿أَسْلَمْتُ لِرَبِّ ٱلْعَٰلَمِينَ﴾ واخۆم دایە دەستی پەروەردگاری هەموو دونیا. لەبەر سوربوون و خۆشەویستیان بۆی، پارێزگاری لێکرد تا وەختی مردنی، ئەو ڕاسپێریەی کرد بۆ منداڵەکانی لەدوای خۆی. وەك خودای مەزن ئەفەرموێت: ﴿وَجَعَلَهَا كَلِمَةًۢ بَاقِيَةً فِى عَقِبِهِۦ﴾[1] کارێکی وای کرد ئەم وتارەی لەپاش خۆی بۆنەتەوەکەی هەربمێنیّ. هەندیّ لەزانایانی پێشینە یەعقوبیان بە مەنسوبی خوێندوەتەوە، عەتفیان کردەوەتە سەر(بنیه)وەك ئەوەی ئیبراهیم ڕاسپێری کردبیّ بۆ منداڵەکانی و کوڕی کوڕەکەی یەعقوبی کوڕی ئیسحاق. کەلەوکاتەدا لەژیاندا بووە و الله أعلم. چونکە ئیسحاق خودا یەعقوبی پێدا لە ژیانی ئیبراهیمی خەلیل و سارەدا. مژدەکە ئەوانیشی گرتەوە،خودای مەزن ئەفەرموێت: ﴿فَبَشَّرْنَٰهَا بِإِسْحَٰقَ وَمِن وَرَآءِ إِسْحَٰقَ يَعْقُوبَ﴾[2] ئەوسا مزگێنیمان پێدا بە ئیسحاق سەرای ئیسحاقیش بە یەعقوب. وە﴿يَعْقُوبَ﴾ بە مەنسوبیش خوێنراوەتەوە. خۆ ئەگەر لەژیانی ئەواندا نەبوایە باسکردنی لە نێوان منداڵەکانی ئیسحاقدا سودێکی وای نەدەبوو. وە دیسان خودای مەزن لەسوورەتی عەنکەبوتا فەرمویەتی: ﴿وَوَهَبْنَا لَهُۥٓ إِسْحَٰقَ وَيَعْقُوبَ وَجَعَلْنَا فِى ذُرِّيَّتِهِ ٱلنُّبُوَّةَ وَٱلْكِتَٰبَ﴾[3] ئێمە ئیسحاق و یەعقوبمان بەو بەخشی و پێغەمبەری و کتێبیشمان کردە بەشی نەتەوەی ئەو. وە لەئایەتێکی ترا ئەفەرموێت: ﴿وَوَهَبْنَا لَهُۥٓ إِسْحَٰقَ وَيَعْقُوبَ نَافِلَةً﴾[4] ئیسحاقیشمان هەرپێبەخشی و یەعقوبیش زیادە بەشیّ بیّ. ئەمەیش دیسان ئەوە دەگەیەنیّ کە هەر لەژیانی ئیبراهیمدا بووە سەلامی خوای لێبیّ قودسی پیرۆزی دروستکردوە. وەك کتێبە پێشوەکان ئامازەیان پێداوە وە لەهەردوو سەحیحەکەدا هاتووە لە ئەبو زەڕەوە، وتم: ئەی پێغەمبەری خودا(ﷺ) کام مزگەوت یەکەم جار دانرا؟ فەرمووی: مەسجد الحرام، وتم: پاشان کامەی تر؟ فەرموی: بەیتول موقەدەس، وتم: نێوانیان چەند بوو؟ فەرموی: چل ساڵ[5].

---

[1] الزخروف ٢٨.

[2] هود ٧١.

[3] العنكبوت ٢٧.

[4] الانبياء ٧٢.

[5] فتح الباری/٦/٤٦٩، مسلم/١/٣٧٠.

دیسان ڕاسپێریەکەی یەعقوبیش بۆ منداڵەکانی بەوزوانە باسی دێت. ئەمەش لێرەدا بەڵگەیە لەسەر ئەوە، کە ئەویش یەکێکە لەوانە کە ڕاسپێری بۆ کراوە.

## پێویستی پابەند بوون بەیەکتا پەرستیەوە تا مردن

خودای گەورە ئەفەرموێت: ﴿يَٰبَنِيَّ إِنَّ ٱللَّهَ ٱصۡطَفَىٰ لَكُمُ ٱلدِّينَ فَلَا تَمُوتُنَّ إِلَّا وَأَنتُم مُّسۡلِمُونَ﴾ فەرزەندانم خودا ئەم ئاینەی بۆ ئێوە هەڵبژاردووە، کەواتە بە مسوڵمانی نەبێ نەمرن. واتە: لە ژیانتاندا چاکەکار بن و لەسەر ئاینی خودا بن تا خودا لەسەر ئەوە بتان مرێنێ. چونکە بەزۆری خەڵکی لەسەر ئەوە دەمرن کەلەسەرینی و لەسەر ئەوەش زیندو دەکرێنەوە، فەرمانی خودایش هەروابووە، هەرکەسێ نیازی کاری چاکی بوبێ خودا یارمەتی داوەو ئاسانکاری بۆکردوە. وە نیازی چاکەیشی بوبێ خودا دامەزراوی کردووە لەسەری. ئەمەش دژایەتی نیە لەگەڵ ئەم فەرمودەدا کە ئەفەرموێت: کەسی واتان هەیە کارو کردەوەی بەهەشتی دەکا تا لەنێوان ئەم و بەهەشتا ئەندازەی گەزێکی دەمێنێ، کەچی نوسراوەکە پێشی دەکەوێ و کارو کردەوەی دۆزەخی دەکا و دەچێتە دۆزەخ، هەروەها کەسی واش هەیە کارو کرداری دۆزەخی دەکا تا بەئەندازەی گەزێکی دەمێنێ و نوسراوەکەی پێش دەکەوێ و کارو کردەوەی بەهەشتی دەکاو دەچێتە بەهەشت[1]. وە لەهەر دوو سەحیحەکەدا هاتووە کە پێغەمبەر (ﷺ) فەرمویەتی: کاوکرداری بەهەشتی دەکا ئەوەی لەخەڵکەوە دیارەو وە کارو کرداری دۆزەخی دەکا ئەوەی لەخەڵکەوە دیارە. خودای مەزن ئەفەرموێت: ﴿فَأَمَّا مَنۡ أَعۡطَىٰ وَٱتَّقَىٰ ۝٥ وَصَدَّقَ بِٱلۡحُسۡنَىٰ ۝٦ فَسَنُيَسِّرُهُۥ لِلۡيُسۡرَىٰ ۝٧ وَأَمَّا مَنۢ بَخِلَ وَٱسۡتَغۡنَىٰ ۝٨ وَكَذَّبَ بِٱلۡحُسۡنَىٰ ۝٩ فَسَنُيَسِّرُهُۥ لِلۡعُسۡرَىٰ﴾[2] کێ لەئێوە دەبەخشێ و لە خودا ترسا، بەپاداشتی زۆر باشیش بڕوای هەیە، بەرەو جێگەی حەسانەوە ڕێی بۆ ئاسان دەکەین، بەڵام ئەوەی ڕژدی کردووتی: کارم بەکەس نیە،پاداشتی هەرەباشیشی پێ درۆبوو، ڕێگەهەرەدژوارەکەی دەخەینەبەر.

﴿أَمۡ كُنتُمۡ شُهَدَآءَ إِذۡ حَضَرَ يَعۡقُوبَ ٱلۡمَوۡتُ إِذۡ قَالَ لِبَنِيهِ مَا تَعۡبُدُونَ مِنۢ بَعۡدِيۖ قَالُواْ نَعۡبُدُ إِلَٰهَكَ وَإِلَٰهَ ءَابَآئِكَ إِبۡرَٰهِـۧمَ وَإِسۡمَٰعِيلَ وَإِسۡحَٰقَ إِلَٰهٗا وَٰحِدٗا وَنَحۡنُ لَهُۥ مُسۡلِمُونَ ۝١٣٣ تِلۡكَ أُمَّةٞ قَدۡ خَلَتۡۖ لَهَا مَا كَسَبَتۡ وَلَكُم مَّا كَسَبۡتُمۡۖ وَلَا تُسۡـَٔلُونَ عَمَّا كَانُواْ يَعۡمَلُونَ ۝١٣٤﴾

## ڕاسپێری یەعقوب بۆ کوڕەکانی لە گیانەڵادا

خودای مەزن ئەفەرموێت: ﴿أَمۡ كُنتُمۡ شُهَدَآءَ إِذۡ حَضَرَ يَعۡقُوبَ ٱلۡمَوۡتُ إِذۡ قَالَ لِبَنِيهِ﴾ ئایا ئێوە ئاگاتان لێبوو کە لە گیانەڵادا یەعقوب بە ڕۆڵەکانی خۆی ووت. خودای مەزن بەڵگە دێنێتەوە بۆ

[1] فتح الباري/٦/١٠٥ ص١٠٨.
[2] الليل ٥—١٠.

بتپەرستەکانی عەرەب لەنەوەی ئیسماعیل و خوانەناسان لەنەوەی ئیسرائیل لە یەعقوب کوڕی ئیسحاق کوڕی ئیبراهیم ڕەزای خوایان لێبێ چونکە کاتێ کە یەعقوب کەوتە گیانەلا ڕاسپاردەی کرد بۆ کوڕەکانی کە تەنیا خودا بپەرستن کە شەریکی نیە. پێی وتن: ﴿مَا تَعْبُدُونَ مِنْ بَعْدِي قَالُوا نَعْبُدُ إِلَٰهَكَ وَإِلَٰهَ آبَائِكَ إِبْرَاهِيمَ وَإِسْمَاعِيلَ وَإِسْحَاقَ﴾ لەدوای من چی دەپەرستن؟ وتیان: چی تۆ پەرستوتە دەی پەرستین کە باب و باپیرانی تۆ ئیبراهیم و ئیسماعیل و ئیسحاقیش هەر ئەویان پەرست. ئەمە لەبابی زاڵ بوونە چونکە ئیسماعیل مامی بووە، نوحاس وتی: عەرەبەکان ناوی مامیان بەباوك دەهێنا. قورتوبی هێناویەتی[1]. ئەوانەی ئەم ئایەتەیان کردەوەتە بەڵگە، ئەو کەسانەن کە باپیریان لەجێ باوك داناوە و برایان بێبەش کردووە لە میراتدا. کەئەوە قسەی ئەبوبەکرە کە بوخاری گێڕاویەتیەوە لە ڕێگەی ئیبنو عەباس و ئیبنو زوبەیرەوە. پاشان بوخاری وتی: ناکۆکی نەبوە لەسەری[2]. دایکی مسوڵمانان عائیشەیش هەروای وتووە،حەسەنی بەسری و تاوس وعەتایش هەروایان وتووە. مالیك و شافعی و ئەحمەدیش کە مەشهورە لێیەوە. (یقاسم الاخوه)، ئەمە ڕیوایەت کراوە لە عومەر و عوسمان و عەلی و ئیبنو مەسعود و زەیدی کوڕی سابت و کۆمەڵێ لەزانایانی پێشینە و پاشینەوە ئەفەرموێت: ﴿إِلَٰهًا وَاحِدًا﴾ کە خودای تاك و تەنیایەو ئێمەش خۆمان بەئەو دەسپێرین. واتە: هیچ شتێ ناکەینە شەریکی، ملکەچ و بەرفەرمانی خوداین. وەك خودای گەورە لە ئایەتێکی ترا ئەفەرموێت: ﴿وَلَهُ أَسْلَمَ مَنْ فِي السَّمَاوَاتِ وَالْأَرْضِ طَوْعًا وَكَرْهًا وَإِلَيْهِ يُرْجَعُونَ﴾[3] کەچی هەرچی لە ئاسمانان و زەویدایە چار و ناچار ملکەچی فەرمانی ئەون و دەشگەڕێنەوە بۆلای ئەو. ئەم ئیسلامە ئاینی گشت پێغەمبەرانە بەبێ جیاوازی با شەریعەت و بەرنامەکانیشیان جیاواز بێ. وەك خودای مەزن ئەفەرموێت: ﴿وَمَا أَرْسَلْنَا مِنْ قَبْلِكَ مِنْ رَسُولٍ إِلَّا نُوحِي إِلَيْهِ أَنَّهُ لَا إِلَٰهَ إِلَّا أَنَا فَاعْبُدُونِ﴾[4] بەر لەتۆش ئێمە هەر پێغەمبەرێکمان نارد، ڕامان سپارد کە: هیچ پەرستویەك جگە لەمن نیە و هەرتەنیا من بپەرستن. ئایەت و فەرمودە لەم بارەیەوە زۆرە لەو فەرمودانە پێغەمبەری خودا(ﷺ) فەرمویەتی: ئێمە کۆمەڵی پێغەمبەران کوڕی یەك باوکین و ئاینمان یەکە دایکمان جیایە[5]. خودای مەزن ئەفەرموێت: ﴿تِلْكَ أُمَّةٌ

---

[1] القرطبی /١٣٨/٢ ص١٠٩.

[2] فتح الباری /١٢/ ١٩.

[3] ال عمران ٨٣.

[4] الانبیاء ٢٥.

[5] أحمد /٢/٣١٩ سه حيحه.

قَدۡ خَلَتۡۖ﴾ ئەوانە كۆمەڵانێك بوون كە ڕابردوون، كردەوەیان بۆ خۆیانە، ئێوەش كردەوەی خۆتان بۆخۆتانە. واتە: ئەو پێشینانە كە ڕابردون و ڕۆشتن لە باب و باپیرانتان لە پێغەمبەران و پیاوچاكان هیچ سودێكتان پێناگەیەنێ لە ڕەچەڵەك و پشتی ئەوان بن، كاتێ كەئێوە چاكەكار نەبن و سود بە خۆتان نەگەیەنن،ئەوان كردەوەی خۆیان بۆخۆیانەو ئێوەش كردەوەتان بۆخۆتانە ﴿لَهَا مَا كَسَبَتۡ وَلَكُم مَّا كَسَبۡتُمۡۖ﴾ كەس بۆ كرداری ئەوان لێتان نلپرسێ، هەربۆیە لەئەسەرا هاتووە: كەسێ كرداری دوای خستبێ ڕەچەڵەكی پەلەی پێنا كات[1].

﴿وَقَالُواْ كُونُواْ هُودًا أَوۡ نَصَٰرَىٰ تَهۡتَدُواْۗ قُلۡ بَلۡ مِلَّةَ إِبۡرَٰهِـۧمَ حَنِيفٗاۖ وَمَا كَانَ مِنَ ٱلۡمُشۡرِكِينَ (١٣٥)﴾

خودای گەورە ئەفەرموێت: ﴿وَقَالُواْ كُونُواْ هُودًا أَوۡ نَصَٰرَىٰ تَهۡتَدُواْۗ قُلۡ بَلۡ مِلَّةَ إِبۡرَٰهِـۧمَ حَنِيفٗاۖ وَمَا كَانَ مِنَ ٱلۡمُشۡرِكِينَ﴾ وتیان: ببنەجوو یان فەلە تارێگا دەركەن، بڵێ: ئێمە لەسەر دینی ئیبراهیمین كە ناهەقی بەجێ هێشتوەو بەهەق هات، شەریكیشی بۆ خودا دانەنا. موحەمەدی كوڕی ئیسحاق ڕیوایەتی كردوە لە ئیبنو عەباسەوە ئەڵێت: عەبدوڵلای كوڕی سوریاس ئەعوەر وتی بە پێغەمبەری خودا(ﷺ) هیچ ڕێگایەك نیە جگە لەوەی ئێمە لەسەرینی ئەی موحەمەمەد.شوێنی ئێمە بكەوە تا ڕێگە دەركەی. گاورەكانیش هەروایان ووت. خودای گەورە ئەم ئایەتەی ناردە خوارەوە ﴿وَقَالُواْ كُونُواْ هُودًا أَوۡ نَصَٰرَىٰ تَهۡتَدُواْ﴾[2] وتیان: ببنە جوو یان گاور تا ڕێگە دەركەن. خودای گەورە ئەفەرموێت: ﴿قُلۡ بَلۡ مِلَّةَ إِبۡرَٰهِـۧمَ حَنِيفٗا﴾ بڵێ: ئێمە لەسەر دینی ئیبراهیمین كە ناهەقی بەجێ هێشتوەو بەرەو هەق هات. واتە: ئێمە نامانەوێ ببینە جولەكە و گاور بەڵكو شوێنی ئاینی ئیبراهیم دەكەوین كە ڕێگەیەكی ڕاست و ڕەوانە. ئەمە قسەی موحەمەدی كوڕی كەعبی قورەزێ عیسای كوڕی جاریەیە[3]. موجاهید و ڕەبیعی كوڕی ئەنەس ئەڵێن: ﴿مِلَّةَ إِبۡرَٰهِـۧمَ حَنِيفٗا﴾ یانی: شوێن كەوتوی ئاینی ئیبراهیمین[4]. ئەبو قەلابە وتی: (الحنیف) ئەو كەسەیە كە بڕوای بەگشت پێغەمبەران هەیە لەیەم پێغەمبەرەوە تا دواین پێغەمبەر[5].

---

[1] مسلم /٤/٢٠٧٤ ص١٠٩.

[2] ابن ابی حاتم/١/٣٩٦.

[3] ابن ابی حاتم /١/٣٩٧.

[4] ابن ابی حاتم/١/٣٩٧.

[5] ابن ابی حاتم /١/٣٩٧.

﴿ قُولُوٓاْ ءَامَنَّا بِٱللَّهِ وَمَآ أُنزِلَ إِلَيۡنَا وَمَآ أُنزِلَ إِلَىٰٓ إِبۡرَٰهِـۧمَ وَإِسۡمَٰعِيلَ وَإِسۡحَٰقَ وَيَعۡقُوبَ وَٱلۡأَسۡبَاطِ وَمَآ أُوتِيَ مُوسَىٰ وَعِيسَىٰ وَمَآ أُوتِيَ ٱلنَّبِيُّونَ مِن رَّبِّهِمۡ لَا نُفَرِّقُ بَيۡنَ أَحَدٖ مِّنۡهُمۡ وَنَحۡنُ لَهُۥ مُسۡلِمُونَ ﴿١٣٦﴾ ﴾

**مسوڵمانان بڕوای بەوانە هەموو هەیە کەلەلایەن خوداوە ڕەوانە کراوە جیاوازی لەنێوان هیچ پێغەمبەرێکا ناکا**

خودای گەورە ئەفەرموێت: ﴿ قُولُوٓاْ ءَامَنَّا بِٱللَّهِ وَمَآ أُنزِلَ إِلَيۡنَا وَمَآ أُنزِلَ إِلَىٰٓ إِبۡرَٰهِـۧمَ وَإِسۡمَٰعِيلَ وَإِسۡحَٰقَ وَيَعۡقُوبَ وَٱلۡأَسۡبَاطِ وَمَآ أُوتِيَ مُوسَىٰ وَعِيسَىٰ وَمَآ أُوتِيَ ٱلنَّبِيُّونَ مِن رَّبِّهِمۡ لَا نُفَرِّقُ بَيۡنَ أَحَدٖ مِّنۡهُمۡ وَنَحۡنُ لَهُۥ مُسۡلِمُونَ ﴾ ئێوە دەڵێن: ئێمە بەخوداو بەو شتانەی بۆمان هاتۆتە خوارو بەوانەی کەڕەوانە کراون بۆ ئیبراهیم و ئیسماعیل و ئیسحاق و یەعقوب و نەوەکانی و ئەوەیش بۆمووسا و عیساش ڕەوانە کراوە ئەوشتانەی کە بەپێغەمبەران درا لەلای پەروەردێنیانەوە باوەڕمان کرد، ئێمە جیاوازی ناخەینە نێوان هیچ کامێك لەمانە و خۆمان هەر بەو سپاردووە. خودای مەزن ڕێنمایی عەبدە خاوەنباوەڕەکانی دەکا کەبڕوایان ببێ بەوەی کە بەهۆی پێغەمبەرەکەیەوە موحەمەد(ﷺ) بۆیان ڕەوانە کراوە بەتەواوی، وە بڕواشیان هەبێ بەوەش کە بۆ پێغەمبەرە پێشینەکان ڕەوانە کراوە، وە باسی هەندێ لە پێغەمبەرەکانی بەدرێژی کردووەو هەندێکیشیان بەکورتی باسکراوە. کە هیچ جیاوازی نەخەنە نێوان پێغەمبەران بەڵکو بڕوایان بەهوو پێغەمبەران ببێ. وەك ئەوانە نەبن کە خودای مەزن دەربارەیان ئەفەرموێت: ﴿وَيُرِيدُونَ أَن يُفَرِّقُواْ بَيۡنَ ٱللَّهِ وَرُسُلِهِۦ وَيَقُولُونَ نُؤۡمِنُ بِبَعۡضٖ وَنَكۡفُرُ بِبَعۡضٖ وَيُرِيدُونَ أَن يَتَّخِذُواْ بَيۡنَ ذَٰلِكَ سَبِيلًا ﴿١٥٠﴾ أُوْلَٰٓئِكَ هُمُ ٱلۡكَٰفِرُونَ حَقّٗا ﴾[1] دیارە دەیان هەوێ لە نێوان خوداو پێغەمبەرەکانی جیاوازی دانێن، دەڵێن: ئێمە باوەڕ بەهەندێکیان دەکەین و هەندێکیان بەجێگەی باوەڕ نازانین. دەیان هەوێ لەونێوانە ڕێگایەك بۆخۆیان پەیدا بکەن، بەڕاستی ئەمانە خوانەناسن. بوخاری ڕیوایەتی کردووە لە ئەبو هورەیرەوە ئەڵێت: ئەهلی کتێب تەوراتیان بە زمانی عیبری دەخوێندەوە و بەعەرەبی مانایان دەکرد بۆ مسوڵمانان. پێغەمبەری خودا(ﷺ) فەرموی: بڕوا بەئەهلی کتێب مەکەن و بەدرۆشیان مەخەنەوە، بەڵکو بڵێن: بڕوامان بەخودا هێناوەو بەوەش بۆمان ڕەوانەکراوە[2]. موسلیم و ئەبو داودو نەسائیش ڕیوایەتیان کردووە لە ئیبنو عەباسەوە ئەڵێت: زۆرجار پێغەمبەری خودا(ﷺ) دوو ڕکاتی پێش نوێژی بەیانی دەکرد ئەمەی دەخوێند: ﴿ءَامَنَّا بِٱللَّهِ وَمَآ أُنزِلَ إِلَيۡنَا ﴾[3] ئێمە بڕوامان بەخوداو بەوەی

---

[1] النساء ١٥٠.

[2] فتح الباری/٨/٢٠ ص١١٠.

[3] مسلم/١/٥٠٢/، أبو داود/٢/٤٦/، النسائی فی الکبری/٦/٣٣٩.

بۆمان ڕەوانە کراوە بڕوامان هێناوە. ئەمەیشی دەخوێند: ﴿ءَامَنَّا بِٱللَّهِ وَٱشْهَدْ بِأَنَّا مُسْلِمُونَ﴾[1] بڕوامان بەخودا هێناوە و تۆش شایەت بە، ئێمە خۆمان بەودەسپێرین. ئەبولعالیە و ڕەبیع و قەتادە ئەڵێن: (الاسباط) نەوەکانی یەعقوبە کە دوانزە پیاو بوون. هەریەك لەو پیاوانە چەند کوڕێکی بوو ناویان لێنان ئەسبات[2]. خەلیلی کوڕی ئەحمەدو کەسانی تریش وتویانە: ئەسبات لەنەوەی ئیسرائیلدا وەك هۆزەکان وابووە لە نەوەی ئیسماعیل، ئەمەیش ئەوە دەگەیەنێ کە ئەسبات لێرەدا مەبەست پێی گەلی نەوەی ئیسرائیل و ئەوەی خودا ناردویەتیە خوارەوە لە نیگا بۆسەر ئەو پێغەمبەرانە سەلامی خوایان لێبێ کەلەناویاندا ڕەوانە کراوە. وەك مووسا پێی وتن: ﴿ٱذْكُرُوا۟ نِعْمَةَ ٱللَّهِ عَلَيْكُمْ إِذْ جَعَلَ فِيكُمْ أَنۢبِيَآءَ وَجَعَلَكُم مُّلُوكًا﴾[3] کە ئەوهەموو پێغەمبەرەی لەناو خۆتان بۆ ڕەوانە کردووە، چەندین پاشای لەناو خۆتان پەیداکردووە. وە خودای مەزن فەرمویەتی: ﴿وَقَطَّعْنَٰهُمُ ٱثْنَتَىْ عَشْرَةَ أَسْبَاطًا﴾[4] ئەوانمان بەدوانزە دەستە بەش بەش کرد. قورتوبی ئەڵێت: (الاسباط)یانی: کۆمەڵ و هۆز کەدەچنەوە سەریەك ئەسڵ[5]. قەتادە ئەڵێت: خودای مەزن فەرمانی داوەبە خاوەنباوەڕان کە بڕوایان بە هەموو کتێب و پێغەمبەرانی ببێ و بەهەقیان بزانن[6]. سولەیمانی کوڕی حەبیب وتی: بێگومان ئێمە فەرمانمان پێکراوە بڕوامان هەبێ بەتەورات و بە ئینجیل، بەلاّم کار بەوە نەکەین کەتیایاندایە[7].

﴿فَإِنْ ءَامَنُوا۟ بِمِثْلِ مَآ ءَامَنتُم بِهِۦ فَقَدِ ٱهْتَدَوا۟ ۖ وَّإِن تَوَلَّوْا۟ فَإِنَّمَا هُمْ فِى شِقَاقٍ ۖ فَسَيَكْفِيكَهُمُ ٱللَّهُ ۚ وَهُوَ ٱلسَّمِيعُ ٱلْعَلِيمُ ﴿١٣٧﴾ صِبْغَةَ ٱللَّهِ ۖ وَمَنْ أَحْسَنُ مِنَ ٱللَّهِ صِبْغَةً ۖ وَنَحْنُ لَهُۥ عَٰبِدُونَ ﴿١٣٨﴾﴾

خودای گەورە ئەفەرموێت: ﴿فَإِنْ ءَامَنُوا۟ بِمِثْلِ مَآ ءَامَنتُم بِهِۦ فَقَدِ ٱهْتَدَوا۟﴾ ئەگەر ئەوانیش بەوەی کە ئێوە بڕواتان هێناوە بڕوا بێنن، ئەوە کەوتونەتە سەر ڕێ. واتە: ئەوانەی خوانەناسن لە ئەهلی کتێب و غەیرەز ئەوانیش وەك ئەوە بڕواتان پێ هێناوە ئەی خاوەنباوەڕان بەگشت کتێب و پێغەمبەرەکانی خوداو جیاوازیتان نەکرد لە نێوانیاندا ئەوە کەوتونەتە سەر ڕێ و تووشی هەق هاتوون: ﴿وَّإِن تَوَلَّوْا۟ فَإِنَّمَا

---

[1] ال عمران ٥٢.
[2] ابن ابی حاتم /١/٣٩٩.
[3] المائدة ٢٠.
[4] الاعراف ١٦٠.
[5] القرطبی /٢/١٤١ ض١١٠.
[6] ابن ابی حاتم /١/٤٠٠.
[7] ابن ابی حاتم /١/٤٠٠.

هُم فِي شِقَاقٍۖ فَسَيَكۡفِيكَهُمُ ٱللَّهُۚ وَهُوَ ٱلسَّمِيعُ ٱلۡعَلِيمُ﴾ بەڵام ئەگەر خۆیان بوارد، ئەوان دژایەتیت ئەکەن، خودا لەئازاری ئەوان دەتپارێزێ، زۆر بیسەرو زۆر زانا هەرخۆیەتی. واتە: دوای هێنانەوەی بەڵگە بۆیان لە هەق لایاندا و بەرەو پڕوپوچ ڕۆشتن، خودا لەوان بتپارێزێ و زاڵت بکا بەسەریاندا و یارمەتیت بدات. ئیبنو ئەبی حاتەم ڕیوایەتی کردووە ئەڵێت: زیادی کوڕی یونس هەواڵی پێداین، نافیعی کوڕی ئەبو نوعەیم بۆی گێڕاینەوە وتی: هەندێ لە جێنشینەکان مەسحەفی عوسمانی کوڕی عەفانیان بۆناردم تا چاکی بکەم. زیاد وتی: پێم وت: خەڵکی دەڵێن: ئەو مەسحەفەی لەباوەشی عوسماندا بوو کاتێ کە شەهید کرا خوێنی کەوتە سەر: ﴿فَسَيَكۡفِيكَهُمُ ٱللَّهُۚ وَهُوَ ٱلسَّمِيعُ ٱلۡعَلِيمُ﴾ خودا لەئازاری ئەوان دەتپارێزێ. نافع ئەڵێت: بەچاوی خۆم خوێنم بینی بەسەر ئەم ئایەتەوە[1]. پاشان خودای مەزن ئەفەرموێت: ﴿ صِبۡغَةَ ٱللَّهِ وَمَنۡ أَحۡسَنُ مِنَ ٱللَّهِ صِبۡغَةٗۖ وَنَحۡنُ لَهُۥ عَٰبِدُونَ ﴾ ڕەنگێکە خودا ڕشتویە و کێ هەیە لەخودا چاکتر ڕەنگ بڕێژێ؟ ئێمەش هەر ئەو دەپەرستین. زەححاك ئەڵێت: لە ئیبنو عەباسەوە خودای مەزن ئەفەرموێت: ﴿فِطۡرَتَ ٱللَّهِ﴾ یانی دینی خودا[2]. هەر بەو جۆرە ڕیوایەت کراوە لە موجاهید و ئەبو عالیە وعیکرەمەو ئیبراهیم و حەسەن و قەتادە و زەححاك و عەبدڵلای کوڕی کەسیر و عەتیەی عەوفی و ڕەبیعی کوڕی ئەنەس و سوددیەوە[3].

﴿ قُلۡ أَتُحَآجُّونَنَا فِي ٱللَّهِ وَهُوَ رَبُّنَا وَرَبُّكُمۡ وَلَنَآ أَعۡمَٰلُنَا وَلَكُمۡ أَعۡمَٰلُكُمۡ وَنَحۡنُ لَهُۥ مُخۡلِصُونَ ﴿١٣٩﴾ أَمۡ تَقُولُونَ إِنَّ إِبۡرَٰهِـۧمَ وَإِسۡمَٰعِيلَ وَإِسۡحَٰقَ وَيَعۡقُوبَ وَٱلۡأَسۡبَاطَ كَانُواْ هُودًا أَوۡ نَصَٰرَىٰۗ قُلۡ ءَأَنتُمۡ أَعۡلَمُ أَمِ ٱللَّهُۗ وَمَنۡ أَظۡلَمُ مِمَّن كَتَمَ شَهَٰدَةً عِندَهُۥ مِنَ ٱللَّهِۗ وَمَا ٱللَّهُ بِغَٰفِلٍ عَمَّا تَعۡمَلُونَ ﴿١٤٠﴾ تِلۡكَ أُمَّةٞ قَدۡ خَلَتۡۖ لَهَا مَا كَسَبَتۡ وَلَكُم مَّا كَسَبۡتُمۡۖ وَلَا تُسۡـَٔلُونَ عَمَّا كَانُواْ يَعۡمَلُونَ ﴿١٤١﴾﴾

خودای گەورە پێغەمبەرەکەی(ﷺ) ئاگاداردەکا لەسەر کێشەی بتپەرستان دەربارەی خوداو ئەفەرموێت: ﴿ قُلۡ أَتُحَآجُّونَنَا فِي ٱللَّهِ﴾ بڵێ: ئێوە لەسەر خودا لەگەڵمان دەکەونە کێشە. واتە: ئێوە مشت و مڕمان لەگەڵا دەکەن دەربارەی یەکتاپەرستی و دڵپاکی و ملکەچی و شوێنکەوتنی فەرمانەکانی خوداو وازهێنان لەقەدەغەکراوەکانی؟ ﴿وَهُوَ رَبُّنَا وَرَبُّكُمۡ﴾ کە پەروەردگاری ئێمەش و ئێوەش ئەوە؟ بەکارەکانماندا ڕادەگا هەر ئەو شایستەی پەرستنەو تاك و تەنیایەو شەریکی نیە ﴿وَلَنَآ أَعۡمَٰلُنَا

---

[1] ابن ابی حاتم /١/٤٠٢ ص١١٠.

[2] ابن ابی حاتم /١/٤٠٢.

[3] ابن ابی حاتم /١/٤٠٣.

﴿ وَلَكُمْ أَعْمَٰلُكُمْ ﴾ کردەی خۆمان بۆخۆمان وکرداری خۆتان بۆخۆتان. ئێمە بێزاری خۆمان دەردەبڕین لە ئێوەو لەوەیش دەیپەرستن. ئێوەش لەئێمە بێزارن. وەك خودای گەورە لە ئایەتێکە ترا ئەفەرموێت: ﴿وَإِن كَذَّبُوكَ فَقُل لِّي عَمَلِي وَلَكُمْ عَمَلُكُمْ أَنتُم بَرِيٓـُٔونَ مِمَّآ أَعْمَلُ وَأَنَا۠ بَرِيٓءٌ مِّمَّا تَعْمَلُونَ ﴾[1] ئەگەر دەڵێن: تۆ درۆ دەکەی بڵێ: ئاکاری من بۆخۆمە و کردەی ئێوەش هەربۆخۆتانە، ئێوە لەکاری من تەریکن وبەرپرسیار نین منیش بەرپرسیار نیم لەو کارەی ئێوە دەیکەن. وە ئەفەرموێت: ﴿ فَإِنْ حَآجُّوكَ فَقُلْ أَسْلَمْتُ وَجْهِيَ لِلَّهِ وَمَنِ ٱتَّبَعَنِ ﴾[2] ئەگەر کێشەت لەگەڵ دەکەن، تۆ هەر بڵێ: من لەگەڵ شوێنکەوتوەکانم بەدڵی پاك ڕومان کردوەتە خوا، تا کۆتایی ئایەتەکە. خودای مەزن دەربارەی ئیبراهیم دەفەرموێت: ﴿ وَحَآجَّهُۥ قَوْمُهُۥ قَالَ أَتُحَٰٓجُّوٓنِّي فِي ٱللَّهِ ﴾[3] هۆزەکەی لەسەر ئەم باسە شەڕو کێشەیان لەگەڵ دەکرد، وتی: خۆ ئێوە لەگەڵ من دەربارەی خودا کێشە دەکەن، تا کۆتایی ئایەتەکە. وەك خودای گەورە ئەفەرموێت: ﴿ أَلَمْ تَرَ إِلَى ٱلَّذِي حَآجَّ إِبْرَٰهِـۧمَ فِي رَبِّهِۦٓ ﴾[4] تۆ ئەو پیاوەت نەدی کەچۆن کێشەی لەگەڵ ئیبراهیمدا دەکرد، وەلەم ئایەتە پیرۆزەدا ئەفەرموێت: ﴿وَلَنَآ أَعْمَٰلُنَا وَلَكُمْ أَعْمَٰلُكُمْ وَنَحْنُ لَهُۥ مُخْلِصُونَ ﴾ کردەوەی خۆمان بۆخۆمان و کرداری خۆتان بۆخۆتان، ئێمە بەدڵ دەیپرستین، واتە: ئێمە لە ئێوە بێزارین، ئێوەش لە ئێمە بێزارن، ئێمە بەدڵ خودا دەپەرستین و شەریکی بۆ پەیدا ناکەین. پاشان خودای مەزن نارەزایی خۆی دەردەبڕێت دەربارەی ئەوە کە جولەکە یان مەسیحەکان دەیڵێن: کە ئیبراهیم و ئەو پێغەمبەرانەی دوای ئەو هاتوون و نەوە کانیشیان لەسەر ئاینی ئەوان بوون کە ئاینی جوولەکە یان ئاینی مەسیحیە و ئەفەرموێت: ﴿ أَمْ تَقُولُونَ إِنَّ إِبْرَٰهِـۧمَ وَإِسْمَٰعِيلَ وَإِسْحَٰقَ وَيَعْقُوبَ وَٱلْأَسْبَاطَ كَانُوا۟ هُودًا أَوْ نَصَٰرَىٰ قُلْ ءَأَنتُمْ أَعْلَمُ أَمِ ٱللَّهُ ﴾ یان دەڵێن: ئیبراهیم و ئیسماعیل و ئیسحاق و یەعقوب و نەوەکانی یەعقوب جوولەکە یان مەسیحیی بوون، بڵێ: خودا چاکتر دەزانێ یان ئێوە؟ واتە: خودا چاکتر دەزانێ و هەواڵی داوە کە ئەوانە نەجوولەکە بوون نە مەسیحیی وەك ئەفەرموێت: ﴿ مَا كَانَ إِبْرَٰهِيمُ يَهُودِيًّا وَلَا نَصْرَانِيًّا وَلَٰكِن كَانَ حَنِيفًا مُّسْلِمًا وَمَا كَانَ مِنَ ٱلْمُشْرِكِينَ ﴾[5] ئیبراهیم نەمووسای بوو

---

[1] یونس ٤١.

[2] ال عمران ٢٠.

[3] الانعام ٨٠.

[4] البقرة ٢٥٨.

[5] ال عمران ٦٧.

نەمەسیحی، بەڵام یەکتا پەرستێك بوو خۆی بەخودا سپاردبوو، هیچ هاوکاری بۆ خودا پەیدا نەدەکرد.

وە ئەفەرموێت: ﴿وَمَنْ أَظْلَمُ مِمَّن كَتَمَ شَهَٰدَةً عِندَهُۥ مِنَ ٱللَّهِ﴾ کێ لەو کەسە ستەمکارترە شایەتیەکی لەلا هەبێ و لەخودای بشارێتەوە؟ حەسەنی بەسری ئەڵێت: لەو کتێبەدا کەبۆیان هاتبوو دەیانخوێندەوە: کە ئاین هەر ئاینی ئیسلامە و موحەمەد(ﷺ) پێغەمبەری خودایە، ئیبراهیم و ئیسماعیل و ئیسحاق و یەعقوب و نەوەکانی یەعقوب تەریکیان لە جوولەکەیی و گاوری و شایەتیان داوە بەوە بەخودا و دانیشیان پێدا ناوە. کەچی ئەو شایەتیەی خودایان لەلای خۆیان شاردۆتەوە لەو بارەیەوە. خودای گەورەیش ئەفەرموێت: ﴿وَمَا ٱللَّهُ بِغَٰفِلٍ عَمَّا تَعْمَلُونَ﴾[1] خودایش لەهەموو ئاکارتان بێ ئاگا نیە. ئەمە هەڕەشەیەکی زۆر توندە، واتە: زانستی خودا دەوری زانیاری ئێوەی داوە، دەزانێ چی دەکەن بەم زوانە پاداشتان ئەداتەوە لەسەری. پاشان خودای مەزن ئەفەرموێت: ﴿تِلْكَ أُمَّةٌ قَدْ خَلَتْ لَهَا مَا كَسَبَتْ وَلَكُم مَّا كَسَبْتُمْ وَلَا تُسْـَٔلُونَ عَمَّا كَانُوا۟ يَعْمَلُونَ﴾ ئەوانە کۆمەڵانێك بوون ئێستا لە نێواندا نەماون، چیان کردبێ بۆخۆیان کرد، ئێوەش کار بۆخۆتان دەکەن، هەرچی ئەوانە کردویانە ئێوەی لێبەرپرس نابن، خۆ حیساب کردنتان لەسەر ئەوان هیچ سودێکتان پێناگەیەنێ جگە لە شوێن کەوتنتان بۆیان. بەخۆ حیسابکردنتان لەسەر ئەوان لەخۆتان بایی مەبن تا وەك ئەوان نەبن و گەردن کەچی فەرمانی خودا نەبن و شوێنی پێغەمبەرەکانی نەکەون کە ڕەوانە کران بە مزگێنی دەرو ترسێنەر، چونکە هەرکەسێ بڕوای بەهەر پێغەمبەرێ لەو پێغەمبەرانە نەبێ، وەك ئەوە وایە کەبڕوای بەهیچ پێغەمبەرێ نەبێ. بەتایبەتیش سەروەری گشت پێغەمبەران و دواین پێغەمبەر(ﷺ) ڕەوانەکراوی پەروەردگاری هەموو جیهانە بۆ گشت مرۆڤ و جنۆکەی موکەلەف سەلامی خودا لەسەر پێغەمبەرو هەموو پێغەمبەرەکانی تریش.

﴿سَيَقُولُ ٱلسُّفَهَآءُ مِنَ ٱلنَّاسِ مَا وَلَّىٰهُمْ عَن قِبْلَتِهِمُ ٱلَّتِى كَانُوا۟ عَلَيْهَا ۚ قُل لِّلَّهِ ٱلْمَشْرِقُ وَٱلْمَغْرِبُ ۚ يَهْدِى مَن يَشَآءُ إِلَىٰ صِرَٰطٍ مُّسْتَقِيمٍ ﴿١٤٢﴾ وَكَذَٰلِكَ جَعَلْنَٰكُمْ أُمَّةً وَسَطًا لِّتَكُونُوا۟ شُهَدَآءَ عَلَى ٱلنَّاسِ وَيَكُونَ ٱلرَّسُولُ عَلَيْكُمْ شَهِيدًا ۗ وَمَا جَعَلْنَا ٱلْقِبْلَةَ ٱلَّتِى كُنتَ عَلَيْهَآ إِلَّا لِنَعْلَمَ مَن يَتَّبِعُ ٱلرَّسُولَ مِمَّن يَنقَلِبُ عَلَىٰ عَقِبَيْهِ ۚ وَإِن كَانَتْ لَكَبِيرَةً إِلَّا عَلَى ٱلَّذِينَ هَدَى ٱللَّهُ ۗ وَمَا كَانَ ٱللَّهُ لِيُضِيعَ إِيمَٰنَكُمْ ۚ إِنَّ ٱللَّهَ بِٱلنَّاسِ لَرَءُوفٌ رَّحِيمٌ ﴿١٤٣﴾﴾

[1] ابن ابی حاتم/١/٤٠٥ ص١١١.

## گواستنەوەی رووگە(قیبلە)

بوخاری ڕیوایەتی کردوە لە بەرائەوە(ڕەزای خوای لێ بێ) کە پێغەمبەری خودا(ﷺ) شانزەیان حەڤدە مانگ ڕووەو قودسی پیرۆز نوێژی کرد،بەلاَم پێغەمبەری خودا(ﷺ) حەزی دەکرد ڕووگەی بەرەو کەعبەی پیرۆز بێت،، یەکەم نوێژێ کردی‌ڕوویەکەعبە نوێژی عەسر بوو، کۆمەڵێ لەگەڵی نوێژیان کرد، پیاوێك لەوانەی کە لەگەڵی نوێژی کرد، کە چووە دەرەوە بەلای خەڵکی مزگەوتا تێپەڕی کە لە ڕکوع دا بوون دەڵێت: خودا دەکەمە شایەت نوێژم کرد لەگەڵ پێغەمبەرا(ﷺ) ڕووەو مەککە. هەر بەو شێوەیە لەنوێژەکەدا ئەوانیش سوڕانەوە ڕووەو مەککە. ئەوانەی کەمردن ڕووەو قیبلە نوێژیان کرد بوو ڕوەو قودس، لەکاتی گواستنەوەی قیبلە بەرەو مەککە کەسانێ بوون کوژران، نازانین چی بڵێین دەربارەیان خودای مەزن ئەم ئایەتەی ناردە خوارەوە: ﴿وَمَا كَانَ ٱللَّهُ لِيُضِيعَ إِيمَـٰنَكُمْ ۚ إِنَّ ٱللَّهَ بِٱلنَّاسِ لَرَءُوفٌ رَّحِيمٌ﴾ ئەو بڕوای هەتانەخودا بە زایەی نەداوە، خودا بەرانبەر بە مەردوم زۆر دڵسۆزو دلۆڤانە. .تەنیا بوخاری خۆی هێناویەتی[1]، موسلمیش بە جۆرێکیتر هێناویەتی[2]. موحەممەدی کوڕی ئیسحاق لە بەرائەوە ڕیوایەتی کردووە، دەڵێت: پێغەمبەری خودا(ﷺ) نوێژی ڕووەو قودسی پیرۆز دەکرد، زۆر سەیری ئاسمانی دەکرد، چاوەڕوانی فەرمانی خودا بوو. خودای گەورە ئەم ئایەتەی ڕەوانە کرد کە ئەفەرموێت: ﴿قَدْ نَرَىٰ تَقَلُّبَ وَجْهِكَ فِى ٱلسَّمَآءِ ۖ فَلَنُوَلِّيَنَّكَ قِبْلَةً تَرْضَىٰهَا ۚ فَوَلِّ وَجْهَكَ شَطْرَ ٱلْمَسْجِدِ ٱلْحَرَامِ﴾ تۆمان دیوە کە بەرەو ئاسمان دەڕوانی،ئێمە ڕووت بەرەو ڕووگەیەك وەردەگێڕین پەسەندت بێ. سا ڕووت بەرەو(مسجد الحرام) وەرگێڕە. پیاوێ لە موسوڵمانان دەڵێت: حەزمان دەکرد ئەگەر بمانزانیایە ئەوانەی لە ئێمەمردن پێش ئەوە ی‌ڕوو وەرگێڕین بەرەو قیبلە(مەککە) چۆنن. ئەو نوێژانەشمان لە ڕووەو قودسی پیرۆز چۆنە. خودای مەزن ئەم ئایەتەی ناردە خوارەوە کە ئەفەرموێت: ﴿وَمَا كَانَ ٱللَّهُ لِيُضِيعَ إِيمَـٰنَكُمْ﴾ خودا ئەو بڕوایەی کە هەتانە بە زایەی نەداوە. هەندێ لە خەڵکە بێ ئاوەزەکان، کە لە ئەهلی کتێب بوون،وتیان چی ئەوانی لەو ڕوویەیان وەرگێڕا کە لە پێشا ڕوویان تێدەکرد؟ خودای مەزن ئەم ئایەتەی ناردە خوارەوە: ﴿سَيَقُولُ ٱلسُّفَهَآءُ مِنَ ٱلنَّاسِ﴾ لەم خەڵکە بێ ئاوەزەکان کە دەڵێن، هەتا کۆتایی ئایەتەکە[3]. عەلی کوڕی ئەبوتەلحە گوتی: لە ئیبنوعەباسەوە: پێغەمبەری خودا(ﷺ) کاتێ کە کۆچی کرد بۆ مەدینە، خودا فەرمانی پێدا کە ڕوو

---

[1] فتح الباري(٨/٢٠).

[2] مسلم(١/٣٧٥).

[3] الطبري(٣/١٣٣).

بکاتە قودسی پیرۆز، جولەکەکان پێیان خۆش بوو، پێغەمبەری خودا(ﷺ) شانزە یان حەڤدە مانگ ڕووی کردە قودسی پیرۆز،بەڵام پێی خۆش بوو ڕوو بکاتە ڕووگەی ئیبراهیم لە مەککە، لەخوا دەپاڕایەوە سەیری ئاسمانی دەکرد،بۆیە خوای گەورە ئەم ئایەتەی ناردە خوارەوە: ﴿فَوَلُّوا وُجُوهَكُمْ شَطْرَهُ﴾. ڕووەرگێڕن بەرەوکەعبەجولەکەکان لەوە کەوتنە گومانەوەو وتیان: چی ئەوانی وەرگێڕا لەو ڕووگەیە کە لە پێشان ڕوویان تێدەکرد؟ خودای مەزن ئەم ئایەتەی ناردە خوارەوە: ﴿قُل لِّلَّهِ ٱلْمَشْرِقُ وَٱلْمَغْرِبُ يَهْدِى مَن يَشَآءُ إِلَىٰ صِرَٰطٍ مُّسْتَقِيمٍ﴾[1] خۆرهەڵاتو خۆرنشین موڵکی خودان، خوا مەیلی لە هەر کەسێ بێ دەیخاتە سەر ڕاستە ڕێ. لەم بەشەدا فەرموودەی زۆر هاتووە، پوختەکەیان ئەوەیە، کاتێ کە پێغەمبەری خودا(ﷺ) فەرمانی پێدرا کە ڕووکاتە بەردەکە لە قودسی پیرۆز، لە مەککەدا لەنێوان دوو ڕوکنەدا نوێژی دەکرد،کەعبەی پیرۆزیش لەبەردەمیدا بوو کە ڕووی دەکردە بەردەکەلەقودسی پیرۆز[2]. کاتێ کەکۆچیکرد بۆمەدینە، ڕوویبۆنەدەکرایە هەردووکیان، خودای مەزن فەرمانی پێدا ڕوویکاتە قودسی پیرۆز. ئەمە قسەی ئیبنوعەبباس‌و جمهورە. لە سەحیحی بوخاریدا ڕیوایەت کراوە لە بەرائی کوڕی عازیبەوە، ئەم هەواڵە گەیشتە کۆمەڵێ لە ئەنساریەکان کەلە نوێژی عەسرا بوون ڕوویان لە قودس بوو، ڕوویان بەرەو کەعبە وەرگێڕا.[3] دیسان لە هەردوو سەحیحەکەدا هاتوە، کە ئیبنوعومەر(ڕەزای خوایان لێ بێ) دەڵێت: لە کاتێکدا خەڵکی لە مزگەوتی قوبادئدالە نوێژی بەیانیدا بوون، لەو کاتەدا کەسێك دێت‌و دەڵێت: پێغەمبەری خودا ئەمشەو قورئانی بۆ هاتۆتە خوار،فەرمانی پێدرا ڕووبکاتە قیبلە(لە مەککە)، ئێوەیش ڕووبکەنە ئەوێ. ڕوویان بەرەو شام بوو، سوڕانەوە بەرەو کەعبە[4] ئەمە بەڵگەیە لەسەر ئەوە کە ئەوەی نەسخ دەکاتەوە، بڕیارەکەی بەجێ ناهێنرێ هەتا دوای ئاگادار بوون لێی. هەرچەند لە پێشیشدا ڕەوانە کرابێ‌و ئاگاداریشی پێدرابێ، چونکە ئەوانە فەرمانیان پێ نەکرا نوێژی عەسرو مەغریب‌و عیشا بگێڕنەوە، والله أعلم. کاتێ کە ئەمە ڕوویدا، دوودڵی‌و گومان‌و ڕاڕایی لەنێوان هەندێ خەڵکی دووڕوو خوانەناس‌و جوولەکەدا پەیدا بوو، سەریان لێ شێواو لە ڕێی ڕاستی ترازان،دەیانوت: ﴿مَا وَلَّىٰهُمْ عَن قِبْلَتِهِمُ ٱلَّتِى كَانُوا۟ عَلَيْهَا﴾ چی ئەوانی وەرگێڕا لەو ڕووگەیەی کە جاران ڕوویان تێدەکرد. واتە: ئەوە چیە ئەمانە جارێ ڕوو لە قودس دەکەن‌و جارێ ڕوو لە کەعبە ؟

---

[1] الطبري(١٣٨/٣).

[2] يعارضه ما ثبت في صحيح البخاري من صلاته(ﷺ) في الحطيم حيثما كان بمكة أنظر حديث(٣٨٥٦).

[3] البخاري(٣٩٩) و كان هؤلاء بن سلمة، وكانوا ساكنين عند مسج القبلتين.

[4] فتح الباري(٢٤/٨)، مسلم(٣٧٥/١).

خودای گەورەیش لە وەلامیاندا فەرمووی: ﴿قُل لِّلَّهِ ٱلْمَشْرِقُ وَٱلْمَغْرِبُ﴾ خۆرهەلات‌و خۆرنشین مولكی خودان. فەرمان وبریاردان هەموو بە دەستی خودایە ﴿فَأَيْنَمَا تُوَلُّوا۟ فَثَمَّ وَجْهُ ٱللَّهِ﴾[1] ڕوو بكەنە هەر لایەك،ڕووی خودا لەوێیە.: ﴿لَّيْسَ ٱلْبِرَّ أَن تُوَلُّوا۟ وُجُوهَكُمْ قِبَلَ ٱلْمَشْرِقِ وَٱلْمَغْرِبِ وَلَٰكِنَّ ٱلْبِرَّ مَنْ ءَامَنَ بِٱللَّهِ﴾[2] كاری چاك هەر ئەوە نیە ڕوو بەرەو ڕۆژهەلات بكەن یان ڕۆژئاوا. چاك ئەوەیە كە بڕواتان بە خودا هەبێ. هەموو شتەكان دەگەڕێتەوە بۆ بەرفەرمانی خودا، بۆ هەر شوێنێ فەرمانمان پێبدا ملكەچبین. خواناسی لە گوێڕایەڵی ئەودایە، ئەگەر فەرمانمان پێبدا لە هەموو ڕۆژێكدا چەند جار ئێمە بەندەی ئەوین، چی بفەرموێت بەجێی دێنین،ڕوو لەو شوێنە دەكەین كە ئەفەرموێت ڕووی تێ بكەن خودای گەورە گرنگیەكی تایبەتی دا بە پێغەمبەرو(ﷺ) ئوممەتەكەی كاتێ كە ڕێی نیشان داون بۆ ڕووگەی ئیبراهیمی خەلیلی خوداو ڕووی كردنە ئەو كەعبەیەی كە لەسەر ناوی خودای گەورە دروست كراوە كە شەریكی نیەو. بەڕێزترین ماڵە لە ماڵەكانی خودا لەسەر زەمیندا. كە ئیبراهیمی خەلیل دروستی كردووە(سەلامی خوای لێ بێ)، بۆیە خودای گەورە ئەفەرموێت: ﴿قُل لِّلَّهِ ٱلْمَشْرِقُ وَٱلْمَغْرِبُ ۚ يَهْدِى مَن يَشَآءُ إِلَىٰ صِرَٰطٍ مُّسْتَقِيمٍ﴾ بلێ: خۆرهەلات‌و خۆرنشین مولكی خودایە مەیلی لە هەركەسێ ببێت دەیخاتە سەر ڕاستە ڕێ. ئیمامی ئەحمد لە عائیشەوە ڕیوایەتی كردوە(ڕەزای خوای لێ بێ) دەڵێت: پێغەمبەری خودا(ﷺ) لەبارەی ئەهلی كتێبەوە فەرموویەتی: (ئەوانە ئیرەیمان پێ نابەن لەسەر هیچ شتێ، وەك ئەوەی ئیرەیمان پێ دەبەن لەسەر ڕۆژی هەینی كە خودا ئێمەی شارەزا كردو ئەوان لێیان تێك چوو، وە لەسەر ئەو ڕووگەیەش كە خودا شارەزای كردین بۆیو ئەوان لێیان تێك چوو. لەسەر ئەوەش كەدوای نوێژ دەڵێین(ئامین))[3].

**ڕێزی ئوممەتی پێغەمبەر( موحەممەد )( ﷺ )**

﴿وَكَذَٰلِكَ جَعَلْنَٰكُمْ أُمَّةً وَسَطًا لِّتَكُونُوا۟ شُهَدَآءَ عَلَى ٱلنَّاسِ وَيَكُونَ ٱلرَّسُولُ عَلَيْكُمْ شَهِيدًا﴾ هەروەها ئێمە ئێوەمان كردە ئوممەتێكی هەڵبژاردە، تا ئاگاتان لە مەردم بێو پێغەمبەریش چاودێریتان لێ بكا. خودای مەزن ئەفەرموێت: كاتێ كە ئێوەمان وەرگێڕا بۆ ڕووگەی ئیبراهیم(سەلامی خوای لێ بێ) و بۆمان هەڵبژاردن تا ئێوە بكەینە چاكترین ئوممەت، بۆ ئەوەی لە ڕۆژی قیامەتا ببنە شایەت بەسەر ئوممەتەكانی ترەوە، چونكە هەموویان دان دەنێن بە ڕێزی ئێوەدا. مەبەست لێرەدا

---

[1] البقرة(١١٥).

[2] البقرة(١٧٧).

[3] أحمد(٦/١٣٤)، پیاوەكانی جێی متمانەن.

لە(وسطاً) واتە: چاكترین‌و باشترین، وەك دەوترێ قورەیش چاكترین ڕەچەڵەك‌و بنەماڵەن. پێغەمبەری خودا ش چاكترینی كەسە لە هۆزەكەیدا، واتە: بەرزترینە‌لە ڕەچەڵەكدا، وەك(الصلاة الوسطی) بەرێزترینی نوێژەكانە كە نوێژی عەسرە. وەك لە سونەنە سەحیحەكاندا هاتووە، خودا ئەم ئوممەتەی تایبەتمەند كرد بە چاكترین ئوممەت، بە تەواوترین پەیڕەو ڕوون و ئاشكراترین ڕێڕووەك خۆی ئەفەرموێت: ﴿هُوَ اجْتَبَاكُمْ وَمَا جَعَلَ عَلَيْكُمْ فِي الدِّينِ مِنْ حَرَجٍ مِّلَّةَ أَبِيكُمْ إِبْرَاهِيمَ هُوَ سَمَّاكُمُ الْمُسْلِمِينَ مِن قَبْلُ وَفِي هَٰذَا لِيَكُونَ الرَّسُولُ شَهِيدًا عَلَيْكُمْ وَتَكُونُوا شُهَدَاءَ عَلَى النَّاسِ﴾[1] ئەو هەر خۆی ئێوەی هەڵبژاردوە، لەم ئاینەشدا تووشی زەحمەتی نەكردوون، هەر ئاینی ئیبراهیمی باوكتانە لە پێشداو لەم قورئانەشدا، هەر ئەو ناوی لێنان موسوڵمان، تا پێغەمبەر شایەت بێ لەسەر ئێوەو ئێوەش شایەت بن لەسەر خەڵك.

ئیمامی ئەحمەد لە ئەبو سەعیدەوە ڕیوایەتی كردوە،: پێغەمبەری خودا(ﷺ) فەرموویەتی: (نووح لە ڕۆژی قیامەتا بانگ دەكرێ، پێی دەوترێ: ئایا گەیاندت؟ دەڵێ: بەڵێ، هۆزەكەی بانگ دەكرێ، پێیان دەوترێ: ئایانووح پێی گەیاندن؟ دەڵێن: هیچ ترسێنەرێكمان بۆنەهاتووەو هیچ كەسێ نەهاتووتە لامان، دەوترێ بە نووح: كێ شایەتیت بۆ ئەدا؟ دەڵێ: موحەممەدو ئوممەتەكەی. دەڵێت: ئەمە ئەوەیە كە خودای گەورە ئەفەرموێت: ﴿ وَكَذَٰلِكَ جَعَلْنَاكُمْ أُمَّةً وَسَطًا ﴾ هەروەها ئێمە ئێوەمان كردە ئوممەتێكی هەڵبژاردە.(الوسط) واتە: دادگەر. بانگ دەكرێن‌و شایەتی بۆ ئەدەن بە گەیاندنی، پاشان منیش شایەتی ئەدەم لەسەرئێوە)[2]، بوخاری و تیرمیزی و نەسائی و ئیبنو ماجەیش ڕیوایەتیان كردوە[3]،

دیسان ئیمامی ئەحمەد لە ئەبوسەعیدی خودەریەوە ڕیوایەتی كردووە: پێغەمبەری خودا(ﷺ) فەرموویەتی: (پێغەمبەری وا دێت لە ڕۆژی قیامەتا دوو پیاو یا زیادتر لە دوو پیاوی لەگەڵیدایە، هۆزەكەی بانگ دەكرێ، دەوترێ: ئایا ئەمە ئاگاداری كردن؟ دەڵێن: نەخێر، پێی دەوترێ: ئایا هۆزەكەت ئاگادارت كرد؟ دەڵێ: بەڵێ، دەوترێ: كێ شایەتیت بۆ ئەدات؟ دەڵێ: موحەممەدو ئوممەتەكەی، بانگ دەكرێن، پێیان دەوترێ: ئایا ئەمە هۆزەكەی ئاگادار كرد؟ دەڵێن: بەڵێ، دەوترێ: ئێوە چۆن دەزانن؟ دەڵێن: پێغەمبەرەكەمان هەواڵی پێداین كە پێغەمبەران گەیاندوویانە. ئەوەیە كە خودای گەورە ئەفەرموێت: ﴿ وَكَذَٰلِكَ جَعَلْنَاكُمْ أُمَّةً وَسَطًا لِّتَكُونُوا شُهَدَاءَ عَلَى النَّاسِ وَيَكُونَ الرَّسُولُ عَلَيْكُمْ شَهِيدًا ﴾[4]، ئیمامی ئەحمەد لە ئەبوئەسوەدەوە ڕیوایەتی كردوەدەڵێت: هاتم بۆ مەدینە،وا

---

[1] الحج(٧٨).

[2] أحمد(٣/٣٢٠)، فەرموودەیەكی سەحیحە.

[3] فتح الباري(٨/٢١)، تحفة الاحوذي(٨/٢٩٧)، النسائي في الكبرى(٦/٢٩٢)، ابن ماجة(٢/١٤٣٢).

[4] أحمد(٣/٥٨)، سەحیحە.

ڕێکەوت نەخۆشیەکی تیا بڵاو بووبوەوە، خەڵکێکی زۆری تێدا دەمردن. لەلای عومەری کوڕی خەتاب دانیشتبووم، جەنازەیەك بە لایدا تێپەڕ کرا، باسی چاکەی خاوەنەکەی کرا، دەڵێت: (وجبت وجبب)، واتە: بەهەشتی برد، بەهەشتی برد بۆ خۆی. پاشان جەنازەیەکی تریش بە لایدا تێپەڕ کرا،باسی خراپی کرا، عومەر دەڵێت: دۆزەخی برد دۆزەخی برد بۆ خۆی. ئەبوئەسوەد دەڵێت: چی برد بۆ خۆی،ئەی گەورەی موسوڵمانان؟ دەڵێت: ئەوە دەڵێم کە پێغەمبەری خودا(ﷺ) فەرموویەتی: (هەر موسوڵمانێ چوار کەس شایەتی چاکەیان بۆدا،خودا دەیخاتە بەهەشت). وتمان ئەی سێ کەس: فەرمووی: (سێ کەسیش)، دەڵێت وتمان: ئەی دوو کەس! فورمووی: (دوو کەسیش)، پاشان پرسیاری یەك کەسمان لێ نەکرد[1] هەر بەم شێوەیە بوخاریو تیرمیزیو نەسائی ڕیوایەتیان کردوە[2].

## لە حیکمەتی وەرگێڕانی ڕووگە

خودای مەزن ئەفەرموێت: ﴿وَمَا جَعَلْنَا ٱلْقِبْلَةَ ٱلَّتِى كُنتَ عَلَيْهَآ إِلَّا لِنَعْلَمَ مَن يَتَّبِعُ ٱلرَّسُولَ مِمَّن يَنقَلِبُ عَلَىٰ عَقِبَيْهِ ۚ وَإِن كَانَتْ لَكَبِيرَةً إِلَّا عَلَى ٱلَّذِينَ هَدَى ٱللَّهُ﴾ ئەو ڕووگەیەی پێشوو کەبەرەوڕووی دەوەستان ئێمە هەر لەبەر ئەوە گۆڕیمان تا بزانین کێ دوای پێغەمبەر دەکەوێو کێش پاشگەز دەبێتەوە. هەرچەندە کارێکی دژوار بوو، مەگەر بۆ کەسانێکی وا کە خوا شارەزای کردوون. خودای گەورە ئەفەرموێت: بۆیە بڕیاری ئەوەمان دا بۆ تۆ ئەی موحەممەد(ﷺ)، کە لە پێشا ڕووبکەیتە قودسی پیرۆز، پاشان ڕوومان وەر گێڕای بەرەو کەعبە، تا ئەوانەی شوێنت دەکەونو گوێڕایەڵیت دەکەن دەرکەون کە ڕوو لە هەر شوێنێ بکەی لەگەڵت ڕووی تێدەکەن، ئەوانەش کە دەرکەون کە پاشگەز دەبنەوە، هەرچەندە ئەم کارە کە ڕوو وەرگێڕانە لە قودسەوە بۆ کەعبە، کارێکی گرانو دژوارە لەسەر دڵەکان مەگەر ئەو کەسانەی کە خوا دڵی شارەزا کردوونو بڕوای تەواویان بە پێغەمبەر هەیەو دەزانن هەرچی ئەو هێناویەتی هەر ئەوە هەقەو گومانی تێدا نیە. خودا ویستی لە هەر شتێ ببێت دەیکاو بڕیاری لەسەر ئەدات.، هەر ئەوە ئەرك دەخاتە سەر بەندەکانی خۆیو هەرچی( نەسخ) بکاتەوە( نەسخی) دەکاتەوە، کارەکانی خودا هەمووی پڕە لە کارزانی و بەڵگەو نیشانەی ڕوون وبەهێز. بە پێچەوانەی ئەوانەوە کە دڵیان نەخۆشە کە هەرکاتێ شتێ ڕوویدات، گومانیان بۆ پەیدا دەبێ. وەك چۆن خاوەنباوەڕان بڕوایان بەهێزو پتەوتر دەبێ. وەك خودای مەزن ئەفەرموێت: ﴿وَإِذَا مَآ أُنزِلَتْ سُورَةٌ فَمِنْهُم مَّن يَقُولُ أَيُّكُمْ زَادَتْهُ هَٰذِهِۦٓ إِيمَٰنًا ۚ فَأَمَّا ٱلَّذِينَ ءَامَنُوا۟ فَزَادَتْهُمْ إِيمَٰنًا وَهُمْ يَسْتَبْشِرُونَ ﴿١٢٤﴾ وَأَمَّا ٱلَّذِينَ فِى قُلُوبِهِم مَّرَضٌ

---

[1] أحمد(١/٢١)، سەحیحە.

[2] فتح الباري(٣/٢٧١)، تحفة الاحوذي(٤/١٦٦)، النسائي(٤/٥١).

فَزَادَتْهُمْ رِجْسًا إِلَىٰ رِجْسِهِمْ ﴾[1] هی وایان لەناودایە، تکاتیێ سورەتێك دێتە خوار، دەڵێ: کێتان بڕوای پێ پتەوتر بووە؟ جا ئەوانەی بڕوایان بە خوا هێناوە، باوەڕیان بەهێزتر دەبێو دڵیان پێی خۆش دەبێ. ئەوانەیش دڵیان نەخۆشەو ساغ نیە، حاشا دێتە سەر حاشایان و بە خوانەناسی دەمرن. ﴿ وَنُنَزِّلُ مِنَ ٱلْقُرْءَانِ مَا هُوَ شِفَآءٌ وَرَحْمَةٌ لِّلْمُؤْمِنِينَ ۙ وَلَا يَزِيدُ ٱلظَّـٰلِمِينَ إِلَّا خَسَارًا ﴾[2] ئێمە لەم قورئانەدا شتی وات بۆ بەڕێ دەکەین کە شیفاو بەزەیی تێدایە بۆ خاوەنباوەڕان، ناهەقیکارانیش زیاتر پێی زیانبار دەبن. هەر بۆیە ئەوانەی کە ڕاوەستا بوون لەسەر بڕوای پتەو بە پێغەمبەر شوێنی کەوتن لەوەدا، چۆن خودا فەرمانی دابوو بەجێیان هێنا بە بێ گومانو دوودڵی.. هەندێ دەڵێن: ئەو هاوەڵە بەڕێزانە لە خاوەن باوەڕەکانی سەرەتابوون لە کۆچەرىو ئەنسارەکان کە نوێژیان کرد بەرەو هەردوو ڕووگەکە. بوخاری لە ئیبنوعومەرەوە ڕیوایەتی کردوەکاتێ خەڵکی نوێژی بەیانیان دەکرد لە مزگەوتی قوبادا، لەو کاتەدا پیاوێك دێت، دەڵێت: قورئان هاتە خوارەوە بۆ پێغەمبەر(ﷺ) فەرمانی پێدا کە ڕوو لە کەعبە بکرێ، ئێوەش ڕوو بکەنە کەعبە.وتی ئەوانیش ڕوویان کردە کەعبەی پیرۆز[3] موسلم[4] و تیرمیزی ڕیوایەتیان کردوە،تەواوە، ئەو خاوەن باوەڕانە لە ڕکوعدا بوون، وەرگەڕان ڕووەو کەعبە[5]. هەر بەم شێوەیە موسلیم ڕیوایەتی کردوە لە ئەنەسەوە،ئەمەبەڵگەیە لەسەر گوێڕایەڵی تەواویان بۆ خوداو بۆ پێغەمبەرەکەیان(ڕەزای خودا لە هەموویان بێت) پاشان خودای مەزن ئەفەرموێت: ﴿وَمَا كَانَ ٱللَّهُ لِيُضِيعَ إِيمَـٰنَكُمْ﴾ ئەو بڕوای کە هەتانەخودابەهەدەری نادا. واتە: ئەو نوێژەی کە لە پێشا ڕووەو قودسی پیرۆز کردوتانە بە زایەی نادو پاداشتەکەی لەلای خودایە. لە فەرموودەی سەحیحا لە ئەبوئیسحاقی سەبیعیەوە لە بەڕائەوە،ڕیوایەت کراوە کۆمەڵێ ڕوویان لە قودسی پیرۆز کردبوو مردبون، خەڵکی وتیان: ئەی حاڵی ئەوانە چۆنە کە ڕوویان لە قودس کردووە؟ خودای مەزن ئەم ئایەتەی ناردە خوارەوە کە ئەفەرموێت: ﴿وَمَا كَانَ ٱللَّهُ لِيُضِيعَ إِيمَـٰنَكُمْ﴾ ئەو بڕوایەی کە هەتانەخوا بە زایەی نادات. تیرمیزی ڕیوایەتی کردوە لە ئیبنوعەباسەوە بە سەحیحیشی داناوە[6] ئیبنوئیسحاق ڕیوایەتی کردوە لە ئیبنوعەباسەوە ﴿وَمَا كَانَ ٱللَّهُ لِيُضِيعَ إِيمَـٰنَكُمْ﴾ خودا ئەو بڕوای کە هەتانە بە زایەی نادا. واتە: ئەو

---

[1] التوبة(١٢٤-١٢٥).

[2] الاسراء(٨٢).

[3] فتح الباري(٨/٢٢).

[4] مسلم(١/٣٧٥).

[5] تحفة الاحوذي(٨/٣٠٠)، سەحیحە.

[6] فتح الباري(٨/٢٠)، تحفة الاحوذي(٨/٣٠٠).

نوێژەی کە ڕووەو قودس کردوتانە بە خەساری نادا، لەگەڵ ئەو بڕوا بوونەتان بە پێغەمبەرەکەتان و شوێن کەوتنتان لەگەڵی بۆ ڕووکردنە کەعبەی پیرۆز. لە هەردوو لایان پاداشتی تەواوتان ئەداتەوە ﴿إِنَّ ٱللَّهَ بِٱلنَّاسِ لَرَءُوفٌ رَّحِيمٌ﴾ خودا بەرانبەر بە مەردوم دڵسۆزو دلۆڤانە.[1] لە فەرموودەی سەحیحادا هاتوە کە پێغەمبەری خودا(ﷺ) ژنێکی بینی لە دیلەکان کە لە منداڵەکەی جیاکرابوەوە،وای لێهاتبوو هەموو منداڵێکی لە دیلەکان باوەش پێدا دەکردو دەیگرت بە سنگیەوە، ئەو ژنە بەدوای منداڵەکەیدا،دەگەڕا کاتێ کە دۆزیەوە گرتیە باوەش و مەمکی خستە دەمی، پێغەمبەری خودا فەرمووی: (ئایاگومان دەبەن ئەو ژنە منداڵەکەی بهاوێتەناو ئاگر، کە بشتوانێ فرێی نەدات؟) وتیان: نەخێر ئەی پێغەمبەری خودا(ﷺ)، فەرمووی: (سا سوێند بە خودا،خودا بە بەزە یترین دەربارەی عەبدەکانی لە ودایکەبۆ منداڵەکەی)[2].

﴿قَدْ نَرَىٰ تَقَلُّبَ وَجْهِكَ فِى ٱلسَّمَآءِ فَلَنُوَلِّيَنَّكَ قِبْلَةً تَرْضَىٰهَا فَوَلِّ وَجْهَكَ شَطْرَ ٱلْمَسْجِدِ ٱلْحَرَامِ وَحَيْثُ مَا كُنتُمْ فَوَلُّوا۟ وُجُوهَكُمْ شَطْرَهُۥ وَإِنَّ ٱلَّذِينَ أُوتُوا۟ ٱلْكِتَـٰبَ لَيَعْلَمُونَ أَنَّهُ ٱلْحَقُّ مِن رَّبِّهِمْ وَمَا ٱللَّهُ بِغَـٰفِلٍ عَمَّا يَعْمَلُونَ ﴿١٤٤﴾﴾

**یەکەم شتێ کە(نەسخ)کراوە لە قورئاندا ڕووگە بوو**

عەلی کوڕی ئەبوتەلحە: لە ئیبنوعەباسەوەدەڵێت: یەکەم شتێ لە قورئاندا(نەسخ) بووەوە ڕووگە بوو، ئەویش کاتێ کە پێغەمبەری خودا(ﷺ) کۆچی کرد بۆ مەدینە، زۆرینەی خەڵکەکەی جوولەکە بوون، خودای مەزن فەرمانی پێدا کە ڕوو لە قودسی پیرۆز بکەن. جوولەکە زۆریان پێ خۆش بوو، زیاتر لە دە مانگ پێغەمبەری خودا ڕووی لە قودسی پیرۆز بوو. پێغەمبەر ڕووگەی ئیبراهیمی پێ خۆش بوو. دەپاڕایەوە لە خوداو سەیری ئاسمانی دەکرد خودای گەورە ئەم ئایەتەی ناردە خوارەوە ﴿قَدْ نَرَىٰ تَقَلُّبَ وَجْهِكَ فِى ٱلسَّمَآءِ فَلَنُوَلِّيَنَّكَ قِبْلَةً تَرْضَىٰهَا فَوَلِّ وَجْهَكَ شَطْرَ ٱلْمَسْجِدِ ٱلْحَرَامِ وَحَيْثُ مَا كُنتُمْ فَوَلُّوا۟ وُجُوهَكُمْ شَطْرَهُۥ﴾ تۆمان دیوە بەرەو ئاسمان دەڕوانی، ئێمە ڕووت بەرەو ڕووگەیەك وەردەگێڕین پەسەندت بێ، سا ڕووت بەرەو(مسجد الحرام) وەرگێڕەو لە هەرکوێش بن، هەر ڕوو بکەنە ئەوێوە. جوولەکەکان کەوتنە گومانەوەو وتیان: ﴿مَا وَلَّىٰهُمْ عَن قِبْلَتِهِمُ ٱلَّتِى كَانُوا۟ عَلَيْهَا ۚ قُل لِّلَّهِ ٱلْمَشْرِقُ وَٱلْمَغْرِبُ﴾ چی ئەوانەی وەرگێڕا لەو ڕووگەیایە کە لە پێشادا ڕوویان تێدەکرد؟ بڵێ: خۆرهەڵات و خۆرنشین موڵکی

---

[1] ابن ابي حاتم غ: (٩٩/١).

[2] مسلم(٢١٠٩/٤).

خودان[1] پاشان خودای مەزن فەرمووی: ﴿فَأَيْنَمَا تُوَلُّوا فَثَمَّ وَجْهُ اللَّهِ﴾[2] ڕوویکەنە هەر لایەك ڕووی خودا لەوێیە.: ﴿وَمَا جَعَلْنَا الْقِبْلَةَ الَّتِي كُنتَ عَلَيْهَا إِلَّا لِنَعْلَمَ مَن يَتَّبِعُ الرَّسُولَ مِمَّن يَنقَلِبُ عَلَىٰ عَقِبَيْهِ﴾ هەر بۆیەمان گۆڕی تا بزانین کێ دوای پێغەمبەر دەکەوێ و کێش پاشگەز دەبێتەوە.

**ئایا ڕووگە( قیبلە ) کەعبە خۆیەتی، یان ڕوویەکی کەعبەیە**

حاکیم لە عەلی کوڕی ئەبوتالیبەوە(ڕەزای خوای لێ بێ)ڕیوایەتی کردوە﴿فَوَلِّ وَجْهَكَ شَطْرَ الْمَسْجِدِ الْحَرَامِ﴾ سا ڕووت بەرەو(مسجد الحرام) وەرگێڕە. دەڵێت: (شطرە) لایەنی[3]. پاشان دەڵێت: سەنەدەکانی سەحیحە. ئەمە قسەی ئەبولعالیەو موجاهیدو سەعیدی کوڕی جوبەیرو قەتادەو ڕەبیعی کوڕی ئەنەس و کەسانی تریشە[4]. ﴿وَحَيْثُ مَا كُنتُمْ فَوَلُّوا وُجُوهَكُمْ شَطْرَهُ﴾ لەهەر کوێش بوون، هەر ڕوویکەنە ئەوێوە. خودای گەورە فەرمانی داوە کە لە هەموو ڕوویەکی زەویەوە،ڕۆژهەڵات و ڕۆژئاوا لە ڕاست و چەپەوە، هەموو نوێژەکان دەگرێتەوە، جگە لە نوێژە سونەتەکان لە کاتی سەفەردا، هەرچۆنێ ڕوو بکات نوێژ دەکا، تەنیا دڵی لەلای کەعبە بێت، لە کاتی شەڕە شمشێریشدا لە کاتی شەڕدا هەرکەسەو چۆن بتوانێ نوێژ دەکا. هەر کەسێ نەزانێ قیبلە کامەیە بە بۆچوونی خۆی ڕوو لە قیبلە دەکا، با بە هەڵەیش ڕووی لە قیبلە کردبێ هەر دروستە. چونکە خودای مەزن بەپێی توانا نەبێ ئەرك ناخاتە سەر هیچ کەسێ.

**گۆڕینی ڕووگە لەلای جولەکەکان زانراوە**

﴿وَإِنَّ الَّذِينَ أُوتُوا الْكِتَابَ لَيَعْلَمُونَ أَنَّهُ الْحَقُّ مِن رَّبِّهِمْ﴾ ئەوانەی ئەهلی کتێبن دەزانن کە ئەمە ڕاستەو لەلایەن پەروەردگاریانەوەیە. واتە: ئەو جوولەکانەی کە دژایەتی ڕووکردنە قیبلەی ئێوە دەکەن و ڕوو وەردەگێڕن لە قودسی پیرۆز، باش دەزانن کە خودا فەرمانت پێدەکا کە ڕوو وەرگێڕی لە قودسی پیرۆزو ڕوو بکەیتە کەعبەی پیرۆز، لە کتێبەکانیاندا لە پێغەمبەرەکانیانەوە هاتوەدەربارەی سیفەتی پێغەمبەرو(ﷺ) ئوممەتەکەی، کە خودای گەورە باسی تایبەتمەندی ئەو پێغەمبەرەو ڕێزو پلەو پایەی کردووەو ئەو پەیامە تێرو تەواوە گەورەیەشی پێدا ڕەوانە کردوە. بەڵام ئەهلی کتێب ئەوە

---

[1] ابن ابي حاتم غ: (١٠٢/١).

[2] البقرة(١١٥).

[3] الحاكم(٢٦٩/٢).

[4] ابن ابي حاتم غ: (١٠٧/١-١٠٩).

دەشارنەوە بە ئیرەیی‌و خوانەناسی‌و لاساری خۆیان، هەر بۆیە خودای گەورە هەڕەشەی توندیان لێ دەکاوت ئەفەرمویت: ﴿وَمَا ٱللَّهُ بِغَٰفِلٍ عَمَّا يَعۡمَلُونَ﴾ خودایش لە هەر کارێ بیکەن ئاگادارەو بێ ئاگا نیە.

﴿وَلَئِنۡ أَتَيۡتَ ٱلَّذِينَ أُوتُواْ ٱلۡكِتَٰبَ بِكُلِّ ءَايَةٖ مَّا تَبِعُواْ قِبۡلَتَكَۚ وَمَآ أَنتَ بِتَابِعٖ قِبۡلَتَهُمۡۚ وَمَا بَعۡضُهُم بِتَابِعٖ قِبۡلَةَ بَعۡضٖۚ وَلَئِنِ ٱتَّبَعۡتَ أَهۡوَآءَهُم مِّنۢ بَعۡدِ مَا جَآءَكَ مِنَ ٱلۡعِلۡمِ إِنَّكَ إِذٗا لَّمِنَ ٱلظَّٰلِمِينَ ١٤٥﴾

**لاساری جوولەکەو خوانەناسی‌و هەڵ نەدانیان**

خودای مەزن باسی خوانەناسی‌و لاساری‌و دژایەتی جوولەکەو ئەوەی دەیزانن دەربارەی پێغەمبەری خودا(ﷺ) خۆ ئەگەر پێغەمبەر هەرچی بەڵگەو نیشانە هەیە کە بۆی هاتوە بۆی بهێنانایە لەسەر ڕاستی پەیامەکەی شوێنی نەدەکەوتن‌و وازیان لەهەواو ئارەزوو خۆیان نەدەهێنا. وەك خودای گەورە ئەفەرمویت: ﴿إِنَّ ٱلَّذِينَ حَقَّتۡ عَلَيۡهِمۡ كَلِمَتُ رَبِّكَ لَا يُؤۡمِنُونَ ٩٦ وَلَوۡ جَآءَتۡهُمۡ كُلُّ ءَايَةٍ حَتَّىٰ يَرَوُاْ ٱلۡعَذَابَ ٱلۡأَلِيمَ﴾[1] ئەو کەسانەی گفتی پەروەردگاری تۆیان لێ هاتە دی، ئیتر باوەڕ ناهێنن. هەموو نیشانەیەکیشیان بۆ بێ.، هەتا ئازاری بە ژان بە چاوی خۆیان دەبینن. هەر بۆیە لێرەیشدا ئەفەرمویت: ﴿وَلَئِنۡ أَتَيۡتَ ٱلَّذِينَ أُوتُواْ ٱلۡكِتَٰبَ بِكُلِّ ءَايَةٖ مَّا تَبِعُواْ قِبۡلَتَكَۚ وَمَآ أَنتَ بِتَابِعٖ قِبۡلَتَهُمۡۚ وَمَا بَعۡضُهُم بِتَابِعٖ قِبۡلَةَ بَعۡضٖ﴾ ئەهلی کتێب هەر نیشانەیەکیان نیشان بدەی، ڕوو لە ڕووگەکەی تۆ ناکەن، تۆش ئیتر ڕوو ناکەیتە ڕووگەی ئەوان، هەر بەم جۆرە هیچ کامیشتان ڕوو ناکەنە ڕووگەی یەکتر. ئەمە باسی زۆر گرنگیدانی پێغەمبەرە(ﷺ) بە فەرمانی خودای گەورە، وەك چۆن جوولەکەکان زۆر پابەندن بە بۆچوون‌و هەواو ئارەزووی خۆیانەوە، پێغەمبەریش(ﷺ) دیسان زۆر پابەند بووە بە فەرمان‌و گوێڕایەڵی‌و شوێن کەوتنی ڕەزامەندی خوداوەو شوێنی ئارەزوی ئەوانە نەدەکەوت، لەبەرئەوەی کە قودسی پیرۆز ڕووگەی ئەوانە، بەڵکو کە ڕووی تێ کردوە لەبەر فەرمانی خودا بووە، پاشان خودای گەورە هەڕەشە دەکات لەو کەسانەی کە دژایەتی هەق دەکەن کە زانایان دەیزانن‌و شوێنی ئارەزوو دەکەون. چونکە زانا زیاتر شارەزای بەڵگەیەو زیاتر بەرپرسیارە لە خەڵکی تر. هەر بۆیە خودای مەزن ڕووی گفت دەکاتە پێغەمبەرو مەبەستیشی ئوممەتەکەشیەتی‌و ئەفەرمویت: ﴿وَلَئِنِ ٱتَّبَعۡتَ أَهۡوَآءَهُم مِّنۢ بَعۡدِ مَا جَآءَكَ مِنَ ٱلۡعِلۡمِ إِنَّكَ إِذٗا لَّمِنَ ٱلظَّٰلِمِينَ﴾ تۆش لەپاش ئەو زانستەی کە بۆت هاتووە، ئەگەر بە شوێن ئارەزووی ئەواندا بڕۆی، لە ناهەقیکاران دەبی.

---

[1] یونس(٩٦-٩٧).

﴿الَّذِينَ ءَاتَيْنَٰهُمُ ٱلْكِتَٰبَ يَعْرِفُونَهُۥ كَمَا يَعْرِفُونَ أَبْنَآءَهُمْ ۖ وَإِنَّ فَرِيقًا مِّنْهُمْ لَيَكْتُمُونَ ٱلْحَقَّ وَهُمْ يَعْلَمُونَ ﴿١٤٦﴾ ٱلْحَقُّ مِن رَّبِّكَ ۖ فَلَا تَكُونَنَّ مِنَ ٱلْمُمْتَرِينَ ﴿١٤٧﴾﴾

## شارەزایی جوولەکە بە پێغەمبەرو( ﷺ ) شاردنەوەی هەق

خودای مەزن ئەفەرموێت: ﴿الَّذِينَ ءَاتَيْنَٰهُمُ ٱلْكِتَٰبَ يَعْرِفُونَهُۥ كَمَا يَعْرِفُونَ أَبْنَآءَهُمْ﴾ ئەهلی کتێب وەك کوڕانی خۆیان ئەم پێغەمبەرە دەناسن. خودای مەزن باسی زانایانی ئەهلی کتێب دەکات کەدەزانن ئەوەی کە پێغەمبەری خودا(ﷺ) بۆی هێناون ڕاستە، وەك چۆن کەسێ لەوان کوڕی خۆی دەناسێ. عەرەبەکان نمونەی شتی ڕاستیان وا دەهێنایەوە، وەك لەم فەرموودەدا هاتووە کە پێغەمبەری خودا(ﷺ) فەرمووی بە پیاوێك منداڵێکی بچوکی خۆی لەگەڵا بوو(ئەمە منداڵی خۆتە؟) دەڵێت: بەڵێ، ئەی پێغەمبەری خودا شایەتی بۆ ئەدەم. فەرمووی: (بێگومان ئەم تاوان دەربارەت ناکاو تۆیش خراپە دەربارەی ناکەی)[1]، قورتوبی دەڵێت: لە عومەرەوە ڕیوایەت کراوەکە دەڵێت بە عبدالله ی کوڕی سەلام: ئایا موحەممەد(ﷺ) دەناسی. وەك چۆن کوڕەکەی خۆت دەناسی؟ دەڵێت: بەڵێ، زیاتریش. ئەمین لە ئاسمانەوە هاتۆتە خوار بۆ سەر ئەمین لە زەمیندا، بە سیفەتەکانی ناسیومە. بەڵام دەربارەی دایکی نازانم چۆن بووە.[2] خودای گەورە ئەفەرموێت لەگەڵ ئەوڕاستیەدا کەبۆیان دەرکەوتووەو دەیزانن ﴿وَإِنَّ فَرِيقًا مِّنْهُمْ لَيَكْتُمُونَ ٱلْحَقَّ وَهُمْ يَعْلَمُونَ﴾ دەستەیەکیش هەرچەندە دەزانن هەق چیە دەیشارنەوە. واتە: ئەوسیفەتانەی کە لەناو کتێبەکەیاندا هەیە لە خەڵکی دەشارنەوە دەربارەی پێغەمبەر(ﷺ) پاشان خودای گەورە پێغەمبەرەکەیی‌و ڕاوەستاو کردو هەواڵی دانێو ئاگاداری کردن کە ئەوەی پێغەمبەر(ﷺ) هێناویەتی هەر ئەوە هەقەو گومانی تێدا نیەوئەفەرموێت: ﴿ٱلْحَقُّ مِن رَّبِّكَ ۖ فَلَا تَكُونَنَّ مِنَ ٱلْمُمْتَرِينَ﴾ ئەمە ڕاستەو لە پەروەردگاری تۆوەیەو هەرگیز دوودڵ مەبە.

﴿وَلِكُلٍّ وِجْهَةٌ هُوَ مُوَلِّيهَا ۖ فَٱسْتَبِقُوا۟ ٱلْخَيْرَٰتِ ۚ أَيْنَ مَا تَكُونُوا۟ يَأْتِ بِكُمُ ٱللَّهُ جَمِيعًا ۚ إِنَّ ٱللَّهَ عَلَىٰ كُلِّ شَىْءٍ قَدِيرٌ ﴿١٤٨﴾﴾

## هەموو ئوممەتێك ڕووگەیەکی هەیە

﴿وَلِكُلٍّ وِجْهَةٌ هُوَ مُوَلِّيهَا ۖ فَٱسْتَبِقُوا۟ ٱلْخَيْرَٰتِ﴾ هەموو لایەك شوێنێکیان هەیە ڕووی تێدەکەن. دەسا ئێوەیش بۆ چاکە پێشبڕکێ بکەن. عەوفی لە ئیبنوعەبباسەوەدەڵێت ﴿وَلِكُلٍّ وِجْهَةٌ هُوَ مُوَلِّيهَا﴾ هەموو

---

[1] أحمد(١٦٣/٤)، فەرموودەیەکی باشە(جید).

[2] القرطبي(١٦٣/٢).

لایەك شوێنێکیان هەیە ڕووی تێدەکەن. مەبەست پێی ئەهلی ئاینەکانە، ئەفەرموێت هەموو گرۆیەك ڕووگەیەکی هەیە پێی ڕازین، ڕووگەی خودا ئەو شوێنەیە خاوەن باوەڕان ڕووی تێدەکەن[1]. ئەبولعالیە دەڵێت: جولەکە لایەکیان هەیە ڕووی تێ دەکەن و نەسرانیش لایەکیان هەیە ڕووی تێدەکەن، ئەی ئەم ئوممەتە! ئێوەش خودا ڕێی نیشان داون بۆ ئەوڕووگەیەی کەهەر ئەو ڕووگەیە[2]. هەربەوجۆرە لە موجاهیدو عەتاو زەحاك و ڕەبیعی کوڕی ئەنەس و سوددی کەسانی تریشەوەڕیوایەتکراوە.[3] ئەم ئایەتە لەو ئایەتە دەچێ کە خودای گەورە ئەفەرموێت: ﴿لِكُلٍّ جَعَلْنَا مِنكُمْ شِرْعَةً وَمِنْهَاجًا ۚ وَلَوْ شَاءَ اللَّهُ لَجَعَلَكُمْ أُمَّةً وَاحِدَةً وَلَٰكِن لِّيَبْلُوَكُمْ فِي مَا آتَاكُمْ ۖ فَاسْتَبِقُوا الْخَيْرَاتِ ۚ إِلَى اللَّهِ مَرْجِعُكُمْ جَمِيعًا﴾[4] بۆ هەر کۆمەڵێك لە ئێوە ڕێوشوێنێکمان داناوە، ئەگەر خودا بیویستایە هەمووی دەکردنە یەك ئوممەت، بەڵام ویستی خوا وابوو لەو شتانەی کە پێی داوین تاقیمان بکاتەوە، دەسا ئێوەش لە کاری چاك پێکەوە کێ بەرکێ بکەن، هەمووتان دەگەڕێنەوە لای خودا. لێرەیشدا ئەفەرموێت: ﴿أَيْنَ مَا تَكُونُوا يَأْتِ بِكُمُ اللَّهُ جَمِيعًا ۚ إِنَّ اللَّهَ عَلَىٰ كُلِّ شَيْءٍ قَدِيرٌ﴾ لە هەر کوێ بن خودا کۆتان دەکاتەوە، خودا توانای بەسەر هەموو شتدا هەیە. واتە: خودا توانای هەیە هەمووتان لە زەویدا کۆ بکاتەوە هەرچەندە لاشەو جەستەتان لە یەکترجیابوبێتەوە.

﴿وَمِنْ حَيْثُ خَرَجْتَ فَوَلِّ وَجْهَكَ شَطْرَ الْمَسْجِدِ الْحَرَامِ ۖ وَإِنَّهُ لَلْحَقُّ مِن رَّبِّكَ ۗ وَمَا اللَّهُ بِغَافِلٍ عَمَّا تَعْمَلُونَ ﴿١٤٩﴾ وَمِنْ حَيْثُ خَرَجْتَ فَوَلِّ وَجْهَكَ شَطْرَ الْمَسْجِدِ الْحَرَامِ ۚ وَحَيْثُ مَا كُنتُمْ فَوَلُّوا وُجُوهَكُمْ شَطْرَهُ لِئَلَّا يَكُونَ لِلنَّاسِ عَلَيْكُمْ حُجَّةٌ إِلَّا الَّذِينَ ظَلَمُوا مِنْهُمْ فَلَا تَخْشَوْهُمْ وَاخْشَوْنِي وَلِأُتِمَّ نِعْمَتِي عَلَيْكُمْ وَلَعَلَّكُمْ تَهْتَدُونَ ﴿١٥٠﴾﴾

**بۆچی سێ جار لەسەر یەك باسی( نەسخی ) ڕووگە کراوە**

ئەمە سێهەم جارەخودای مەزن باسی ڕووکردنە(مسجد الحرام) دەکات لەهەموکیشوەرەکانی زەمیندا، وتراوە: لەبەر ئەوەی چونکە ئەم باسە پەیوەندی بەم دەقەوەهەیە لە ج یەکەمجاروج دواییش، یەکەمجار ئەفەرموێت: ﴿قَدْ نَرَىٰ تَقَلُّبَ وَجْهِكَ فِي السَّمَاءِ ۖ فَلَنُوَلِّيَنَّكَ قِبْلَةً تَرْضَاهَا﴾ تۆمان

[1] الطبري(٣/١٩٣).
[2] ابن ابي حاتم غ: (١/١٢١).
[3] ابن ابي حاتم غ: (١/١٢١-١٢٢).
[4] المائدة(٤٨).

دیوە کە بەرەو ئاسمان دەڕوانی، ئێمە ڕووت بەرەو ڕووگەیەك وەردەگێڕین پەسەندت بێ. هەتا دەگاتە ﴿وَإِنَّ ٱلَّذِينَ أُوتُوا۟ ٱلْكِتَـٰبَ لَيَعْلَمُونَ أَنَّهُ ٱلْحَقُّ مِن رَّبِّهِمْ ۗ وَمَا ٱللَّهُ بِغَـٰفِلٍ عَمَّا يَعْمَلُونَ﴾ ئەوانەی ئەهلی کتێبن دەزانن کە ئەمە ڕاستەو لە پەروەردگارمانەوەیە، خودایش لە هەرکارێ بیکەن ئاگادارە. لێرەدا خودا باسی وەرگرتنی داواکەی پێغەمبەر(ﷺ) دەکا. فەرمانی پێدەدات ڕوو لەو ڕووگەیە بکات کە حەزی لێیەتی‌و پێی خۆشە. لە جاری دووهەمدا ئەفەرموێت: ﴿وَمِنْ حَيْثُ خَرَجْتَ فَوَلِّ وَجْهَكَ شَطْرَ ٱلْمَسْجِدِ ٱلْحَرَامِ ۖ وَإِنَّهُۥ لَلْحَقُّ مِن رَّبِّكَ ۗ وَمَا ٱللَّهُ بِغَـٰفِلٍ عَمَّا تَعْمَلُونَ﴾ لە هەر شوێنێکەوە دەرچووی، ڕوو بکە(مسجد الحرام) ئەمە ڕاستەو لە پەروەردگاری تۆوەیە، هەر کارێکیش ئێوە بیکەن خودا دەیزانێ. لێرەدا فەرموویەتی: ئەمە ڕاستیەکەو لە پەروەردگارتەوەیە لەپلەی یەکەم بەرزبووەتەوە، کەڕێکەوتوە لەگەڵ ڕەزامەندی پێغەمبەرا(ﷺ) دیسان ڕوونی کردۆتەوە کە ئەمەیش هەقەو لەلایەن خوداوەیەو پێی ڕازیەمەبەست لەجاری سێهەم حیکمەتی پوچەڵکردنەوەی بەڵگەی ئەوانەی ناکۆکن لەو جوولەکانەی کە ناڕەزایی دەردەبڕن لەسەر ئەوەی کە پێغەمبەر(ﷺ) ڕووی کردۆتە ڕووگەی ئەوان، کە ئەوان زانیویانە چونکە لەناو کتێبەکەیاندایە، کە پێغەمبەر(ﷺ) ڕوو وەردەگێڕێ لە قودسی پیرۆزەوە بۆ ڕووگەی ئیبراهیم(سەلامی خوای لێ بێ). کە کەعبەی پیرۆزە، بت پەرستە عەرەبەکانیش هیچ بەڵگەیەکیان نامێنێ، چونکە ڕێزی زۆری کەعبەیان دەگرت‌و زۆر بە لایانەوە خۆش بوو کە پێغەمبەر ڕووی تێکرد.

## حیکمەتی نەسخی ڕووگە

خودای مەزن ئەفەرموێت: ﴿لِئَلَّا يَكُونَ لِلنَّاسِ عَلَيْكُمْ حُجَّةٌ﴾ تا هیچ بەڵگەلە دژی ئێوە بە دەس خەڵکەوە نەبێ. واتە: ئەهلی کتێب سیفەتی ئەم ئوممەتە دەزانن کە ڕوو لە کەعبەی پیرۆز دەکەن، خۆ ئەگەر ئەم سیفەتەیان نەمێنێ، ئەوە دەکەنە بەڵگە لەسەریان، بۆ ئەوەی بەڵگەیان بە دەستەوە نەمێنێ دەربارەی موسوڵمانان کە ڕوویان لە قودسی پیرۆز کردوە. پاشان خودای مەزن ئەفەرموێت: ﴿إِلَّا ٱلَّذِينَ ظَلَمُوا۟ مِنْهُمْ﴾.مەگەرئەوانەیان کەستەمکارن مەبەست پێی موشریکەکانی قورەیشە لە بەڵگەی ئەو ناهەقیکارانە دەهێننەوە کە پڕوپووچە. کە دەڵێن: ئەم پیاوە دەڵێ لەسەر ئاینی ئیبراهیمە، ئەگەر ڕوو کردنەکەی بۆ قودسی پیرۆز لەسەر ئاینی ئیبراهیمە بۆچی لێی پەشیمان بووەوە. وەڵامەکەی ئەوەیە خودای مەزن فەرمانی پێدا کە ڕوو بکاتە قودسی پیرۆز لە سەرەتاوە. خودا خۆی کارزانە دەزانێ لەبەر چی، پێغەمبەریش(ﷺ) گوێڕایەڵی فەرمانی خودای کردوە، پاشان فەرمانی پێداوە کە ڕوو وەرگێڕێ بەرەو ڕووگەی ئیبراهیم کە کەعبەی پیرۆزە. لەمەیشدا هەر گوێڕایەڵی فەرمانی خودای کردوە، پێغەمبەری خودا(ﷺ) لە هەموو کارو فەرمانێکیدا کەر بەرفەمانی خودا بووە، چاوتروکانێك لە فەرمانی خودا دەرنەچووە، ئوممەتەکەیشی هەر شوێنی ئەو کەوتون. پاشان

خودای گەورە ئەفەرموێت: ﴿فَلَا تَخْشَوْهُمْ وَٱخْشَوْنِي﴾: ئێوە لە گومانو ناهەقیو لاساری ئەوانە مەترسن، تەنها هەر لە من بترسن. ﴿وَلِأُتِمَّ نِعْمَتِي عَلَيْكُمْ﴾ من دەمەوێ تەواو چاکەتان لەگەڵ بکەم. ئەم دەقە عەتف کراوەتە سەر ئەم ئایەتە: ﴿لِئَلَّا يَكُونَ لِلنَّاسِ عَلَيْكُمْ حُجَّةٌ﴾ تا هیچ بەڵگەی دژی ئێوە بەدەس خەڵکەوە نەبێ. واتە: تا ئەو بەهرانەی خۆم تەواو بکەم لەسەرتان دەربارەی ڕەواکردنی قیبلە بۆتان کە ڕووی تێبکەن، ئەم شەریعەتەتان لە گشت لایەکەوە بۆ تەواو بکەم ﴿وَلَعَلَّكُمْ تَهْتَدُونَ﴾ دەمەوێ شارەزا بن واتە: لەوەی کە ئوممەتەکانی تر لێیان ون بووە، ئێوەمان لێ شارەزا کرد، تایبەتمان کرد بە ئێوەوە، هەر بۆیە ئەم ئوممەتە بەڕێزترینو چاکترین ئوممەتە.

﴿كَمَآ أَرْسَلْنَا فِيكُمْ رَسُولًا مِّنكُمْ يَتْلُوا۟ عَلَيْكُمْ ءَايَٰتِنَا وَيُزَكِّيكُمْ وَيُعَلِّمُكُمُ ٱلْكِتَٰبَ وَٱلْحِكْمَةَ وَيُعَلِّمُكُم مَّا لَمْ تَكُونُوا۟ تَعْلَمُونَ (١٥١) فَٱذْكُرُونِىٓ أَذْكُرْكُمْ وَٱشْكُرُوا۟ لِى وَلَا تَكْفُرُونِ (١٥٢)﴾

**ڕەوانە کردنی پێغەمبەر(ﷺ) چاکەیەکی زۆر گەورەیە دەبێ شوکرو یادی خوای لەسەر بکرێ**

خودای مەزن بەهرەکانی خۆی وەبیر بەندەکانی دەهێنێتەوە، لە ڕەوانە کردنی پێغەمبەردا کە ئایەتەکانی خودا دەخوێنێتەوە بۆیانونەفامانە لە خووڕەوشتی پیسو ناشیرینو کرداری نەفامیو لە تاریکستان دەریان دێنێو بەرەو ڕووناکی دەیانبات، فێری کتێبیان دەکات کەقورئانە، فێری حیکمەتیان دەکات کەسوننەتەو ئاگاداریان دەکات لەو شتانەی کە لە کاتی نەفامیدا زۆر بێ ئاگاوبوون بە قسەی درۆو دەلەسە،دەخەڵەتان بەهۆی خێرو بەرەکەتی ئەو پەیامەی کە بە پێغەمبەرەکەیدا ناردویەتی بۆیان، کردوونی بە پیاوچاکو زاناو فێری زانیاری باشو دڵپاکیو کەم ئەرکیو ڕاستگۆیی بوون، خودای مەزن ئەفەرموێت: ﴿لَقَدْ مَنَّ ٱللَّهُ عَلَى ٱلْمُؤْمِنِينَ إِذْ بَعَثَ فِيهِمْ رَسُولًا مِّنْ أَنفُسِهِمْ يَتْلُوا۟ عَلَيْهِمْ ءَايَٰتِهِۦ وَيُزَكِّيهِمْ﴾[1] خاوەنباوەڕان بەر منەتی چاکەی خودان کە یەکێك هەر لە خۆیانی ناردو پێغەمبەریان بێ، نیشانەکانی خودایان بەسەردا دەخوێنێتەوەو بە خاوێنی ڕایان دەگرێ‌سەرکۆنەی ئەو کەسانەش دەکات کە نازانن ڕێزی ئەم بەهرەیە بگرن، ئەفەرموێت: ﴿أَلَمْ تَرَ إِلَى ٱلَّذِينَ بَدَّلُوا۟ نِعْمَتَ ٱللَّهِ كُفْرًا وَأَحَلُّوا۟ قَوْمَهُمْ دَارَ ٱلْبَوَارِ﴾[2] ئایا نەتدی ئەو کەسانەی ناشوکریان لە بەرانبەر چاکەی خودادا کردوەو گەلی خۆیان بەرەو هەڵدێر برد. مەبەست لە بەهرەی خودا موحەممەدە(ﷺ)[3]، هەر بۆیە

---

[1] آل عمران(١٦٤).

[2] ابراهيم(٢٨).

[3] البخاري(٣٩٧٧).

خودای مەزن خاوەن باوەڕان ئاگادار دەكاتەوە كەدان بنێن بەو بەهرانەداو یادو شوكری خودای لەسەر بكەن ﴿وَيُعَلِّمُكُم مَّا لَمْ تَكُونُوا۟ تَعْلَمُونَ﴾ زۆر شتی واتان فێر دەكات كە لە پێشدا نەتان دەزانی. پاشان ئەفەرموێت: ﴿فَٱذْكُرُونِىٓ أَذْكُرْكُمْ﴾ سائێوە یادی من بكەن، تا منیش لەبیرتان نەكەم، هەر شوكرانە بژێری من بن‌و لە چاكەی من حاشا مەكەن.لەبارەی‌ئەمەوە موجاهیددەڵیت لەم ئایەتە: ﴿كَمَآ أَرْسَلْنَا فِيكُمْ رَسُولًا﴾ولتە: (وەك ئەمەی پێغەمبەرێكمان لەخۆتان ناردە لاتان) خودای مەزن: مەبەستی ئەوەیە وەك چۆن من ئاوام كرد ئێوەیش یادی من بكەن[1] حەسەنی بەسری دەڵێت لەم دەقەدا كە خودای مەزن ئەفەرموێت: ﴿فَٱذْكُرُونِىٓ أَذْكُرْكُمْ﴾ ئێوە یادی من بكەن تامنیش لە بیرتان نەكەم، دەڵێت: ئێوە یادی من بكەن لەسەر ئەو فەرزانەی كە لەسەرم داناون تا منیش لەبیرتان نەكەم لەو شتانەی كە لەسەر خۆ داناوە بۆ ئێوە[2] لە فەرموودەی سەحیح یشدا هاتووە(خودای مەزن ئەفەرموێت: هەركەسێ یادی منی كردبێ لە دەروونی خۆیدا منیش لە بیرم نەكردوە لەلای خۆم. وە هەر كەسێ یادی منی كردبێ لەناو كۆڕو كۆمەڵێكدا، منیش باسم كردوە لەناوكۆمەڵێ لەوە چاكتر)[3]، ئیمامی ئەحمەد ڕیوایەتی كردوە لە ئەنەسەوە، دەڵێت: پێغەمبەری خودا(ﷺ) فەرموویەتی: (خودای مەزن فەرموویەتی: ئەی نەوەی ئادەم ئەگە لە دەروونی خۆتدا یادی منت كردبێ، منیش تۆم لەبیر نەكردوە لەلای خۆم. ئەگەر باسی منت كردبێ لە كۆڕو كۆمەڵێكا منیش تۆم لەبیر نەكردوە لەناو كۆمەڵێ لە فریشتەكاندا(یان لەناو كۆمەڵێكا لەوە چاكتر) ئەگەر بستێ لە من نزیك بوویبیتەوە، منیش باڵێ لە تۆ نزیك بوومەتەوە. ئەگەر باڵێ لە من نزیك بوویبیتەوە منیش گەزێك لە تۆ نزیك بوومەتەوە. ئەگەر بە ئاسایی بێیت بۆ لام، منیش بە ڕاكردن دێم بۆ لات)، سەنەدەكانی سەحیحە، بوخاری ڕیوایەتی كردوە[4] ئەفەرموێت: ﴿وَٱشْكُرُوا۟ لِى وَلَا تَكْفُرُونِ﴾ هەر شوكرانە بژێری من بن‌و لە چاكەی من حاشا مەكەن. خودای گەورە فەرمانی داوە كە سوپاس‌و ستایش بكرێ،بەڵێنی داوە لەسەر ئەو سوپاس‌و ستایش كردنە بە چاكەی زۆرو ئەفەرموێت: ﴿وَإِذْ تَأَذَّنَ رَبُّكُمْ لَئِن شَكَرْتُمْ لَأَزِيدَنَّكُمْ ۖ وَلَئِن كَفَرْتُمْ إِنَّ عَذَابِى لَشَدِيدٌ﴾[5] پەروەردگارتان ڕایگەیاند: ئەگەر شوكرانە بژێر بن، بۆتان زیاد دەكەم، خۆ ئەگەر سەرپێچی بكەن.

---

[1] الطبري(٣/٢١٠).

[2] ابن ابي حاتم غ: (١/١٤).

[3] فتح الباري(١٣/٣٩٥).

[4] أحمد(٣/١٣٨)، فتح الباري(١٣/٥٢١).

[5] ابراهيم(٧).

جەزرەبەم زۆر توندو تیژە. ئیمامی ئەحمەد ڕیوایەتی کردوە لە ئەبورەجائی عەتاردیەوە دەڵێت: عیمرانی کوڕی حوصەین هاتە دەرەوە بۆلامان، باڵاپۆشێکی لەبەر دابوو، بەرلەوە نە مدیبوو لەبەری کردبێ،دوایش نەمبینی لەبەری بکاتەوەدەڵێت: پێغەمبەری خودا(ﷺ) فەرموویەتی: (هەرکەسێ خودا نیعمەتێکی پێ بەخشی، بێگومان پێی خۆشە نیشانەی ئەو نیعمەتە ببینێ لەسەر دروستکراوەکانی). جارێکیش(ڕەوح) دەڵێت: لە سەر بەندەکەی[1](واتەدروستکراوەکانی واتەبەندەکانی).

﴿ يَٰٓأَيُّهَا ٱلَّذِينَ ءَامَنُوا۟ ٱسْتَعِينُوا۟ بِٱلصَّبْرِ وَٱلصَّلَوٰةِ ۚ إِنَّ ٱللَّهَ مَعَ ٱلصَّٰبِرِينَ ﴿١٥٣﴾ وَلَا تَقُولُوا۟ لِمَن يُقْتَلُ فِى سَبِيلِ ٱللَّهِ أَمْوَٰتٌۢ ۚ بَلْ أَحْيَآءٌ وَلَٰكِن لَّا تَشْعُرُونَ ﴿١٥٤﴾ ﴾

## ڕێزو چاکی و خۆڕاگری نوێژ کردن

دوای ئەوەی خودای مەزن باسی سوپاس گوزاری کرد، ئینجا باسی خۆڕاگری‌و ڕێنمایی کردن بۆ خۆڕاگری‌و نوێژ کردن،دەکات چونکە بەندە یان لە نازو نیعمەتایە سوپاسی خودای لەسەر دەکات، یان تووشی ناڕەحەتی‌و بەلا بووەو لەسەری‌ئارام دەگرێ، وەك لەم فەرموودەیەدا هاتووە: (کاروباری خاوەن باوەڕ جێی سەرسوڕمانە، خودا هیچ فەرمانێك نادا بەسەریدا مەگەر ئەوە خێرو بێرە بۆی، ئەگەر تووشی خۆشگوزەرانی هات سوپاسی خوا دەکات. دەبێتە مایەی خێر بۆی، خۆ ئەگەر تووشی زیانێکیش هات ئارام دەگرێت هەر دەبێتە مایەی خێر بۆی)[2]. خودای گەورە ڕوونی کردۆتەوە کە چاکترین شتێك کە بەندە پشتی پێ ببەستێ لە کاتی بەلاو ناڕەحەتیدا خۆڕاگری‌و نوێژ کردنە. وەك خودای گەورە دەفەرموێت﴿وَٱسْتَعِينُوا۟ بِٱلصَّبْرِ وَٱلصَّلَوٰةِ ۚ وَإِنَّهَا لَكَبِيرَةٌ إِلَّا عَلَى ٱلْخَٰشِعِينَ﴾ هانا بەرن بۆ خۆڕاگری و نوێژ کردن کە ئەم کارە زۆر دژوارە مەگەر هەر بۆ ئەو کەسانەی کە خۆیان بە زل نازانن. خۆڕاگری دوو جۆرە، خۆڕاگریی لەسەر وازهێنان لە قەدەغەکراو وتاوانەکان، خۆڕاگریش لەسەرخواپەرستی‌و ئەو شتانەی بەندە خوداوە نزیك دەکاتەوە. بەڵام دووهەمیان پاداشتی زۆرترە چونکە مەبەستەکە ئەوەیە. سێهەم، خۆڕاگریە لەسەر بەلاو ناڕەحەتیەکان، ئەمەیش واجیبە، وەك پاڕانەوەو داواکردنی لێبوردن لە تاوانەکان، وەك عەبدوڕەحمانی کوڕی زەیدی کوڕی ئەسلەم دەڵێت: خۆڕاگری دوو جۆرە: خۆڕاگریەك لەبەر خودا، لەسەر ئەوەی کە پێی خۆشە با لەسەر دڵو جەستەش گران بێ. خۆڕاگری لەبەر خودا لە شتێکدا کە ناخۆشە، با ئارەزوویش دژایەتی بکات. هەرکەسێ ئاوا بوو، ئەو کەسە لەو خۆڕاگرانەیە کە خودا لەئارامیی وئاسایشدادەیانزێینێ.

---

[1] أحمد(٤/٤٣٨)، فەرموودەیەکی حەسەنە.

[2] مسلم(٤/٢٢٩٢).

## ژیانی شەهیدان

﴿وَلَا تَقُولُوا لِمَن يُقْتَلُ فِي سَبِيلِ اللَّهِ أَمْوَاتٌ ۚ بَلْ أَحْيَاءٌ وَلَٰكِن لَّا تَشْعُرُونَ﴾ بەو کەسانەی کە لەڕێی خوادا دەکوژرێن مەڵێن: مردوون، بەڵکە زیندوون ئێوە پێی نازانن. خودای گەورە باسی شەهیدان دەکات کە لە ژیانی بەرزەخدا ڕۆزی ئەدرێن وەك لە سەحیحی موسلیما هاتوە: (گیانی شەهیدان وا لەناو سکی باڵندەیەکی سەوزا، بۆ هەر کوێ بیانەوێ لە بەهەشتدا دەگەڕێن. پاشان دێنەوە بۆ لای ئەو چرایانە کە لە ژێرعەرشدا هەڵواسراون، پەروەردگاریان تەماشایەکیان دەکات و ئەفەرموێت: ئایا حەز لە چی دەکەن؟ دەڵێن: حەز لە چی بکەین ئەی پەروەردگارمان، شتێکت پێداوین بە هیچ کەسێ لەدروستکراوەکانی خۆتت نەداوە؟ پاشان هەرئەوقسەیان پێدەڵێتەوە، کاتێ دەبینن هەر وازیان لێ ناهێنرێ تا داوای شتێك نەکەن، دەڵێن: دەمانەوێ بمانگێڕیتەوە بۆ دنیاتا لەپێناوی تۆدا بجەنگین و جارێکی ترەهەر لە پێناوی تۆدا بکوژرێین[1]،(کاتێ کە پاداشتی شەهیدی دەبینن) پەروەردگاریش ئەفەرموێت: من نوسیوومە ئەوانە جارێکی تر ناگەڕێنەوە)، لە فەرمودەی ئیمامی ئەحمەدو ئیمامی شافیعیو ئیمامی مالیك ڕیوایەتیان کردوەوە لە زوهری لە عەبدوڕەحمانی کوڕی کەعبی کوڕی مالیکەوە لە باوکیەوە دەڵێت: پێغەمبەری خودا(ﷺ) فەرموویەتی: (گیانی خاوەنباوەڕ باڵندەیەکە هەڵواسراوە بە درەختێکی بەهەشتەوە، هەتا خودا دەیگێڕێتەوە بۆناوجەستەی ئەو ڕۆژەی کە زیندوی دەکاتەوە)[2]، ئەم فەرموودەیە بەڵگەیە بۆ هەموو موسوڵمانانیش، هەرچەندە شەهیدان بەتایەبەتی باسیان هاتووە لە قورئاندا بۆ زیاترڕێزلێنانیان.

﴿ وَلَنَبْلُوَنَّكُم بِشَيْءٍ مِّنَ الْخَوْفِ وَالْجُوعِ وَنَقْصٍ مِّنَ الْأَمْوَالِ وَالْأَنفُسِ وَالثَّمَرَاتِ ۗ وَبَشِّرِ الصَّابِرِينَ ﴿١٥٥﴾ الَّذِينَ إِذَا أَصَابَتْهُم مُّصِيبَةٌ قَالُوا إِنَّا لِلَّهِ وَإِنَّا إِلَيْهِ رَاجِعُونَ ﴿١٥٦﴾ أُولَٰئِكَ عَلَيْهِمْ صَلَوَاتٌ مِّن رَّبِّهِمْ وَرَحْمَةٌ ۖ وَأُولَٰئِكَ هُمُ الْمُهْتَدُونَ ﴿١٥٧﴾﴾

## باوەڕدار تاقیدەکرێتەوە، کەئارام دەگرێ پاداشت دەدرێتەوە

خودای مەزن ئاگادارمان دەکات کەبەندەکانی تاقیدەکاتەوە: وەك ئەفەرموێت: ﴿وَلَنَبْلُوَنَّكُمْ حَتَّىٰ نَعْلَمَ الْمُجَاهِدِينَ مِنكُمْ وَالصَّابِرِينَ وَنَبْلُوَ أَخْبَارَكُمْ﴾[3] تاقییتان دەکەینەوە، تا بزانین، کێ لە ئێوە تێکۆشاوەو کێتان خۆڕاگرتر بووە،تا بەراوردی دەنگو باسی ئێوەش بکەین. جارێ بە خۆشگوزەرانیو جارێك بە

[1] مسلم(٢/١٥٠٢).

[2] أحمد(٣/٤٥٥)، سەحیحە.

[3] محمد(٣١).

ناخۆشی لە ترس‌و برسیەتی، خودای مەزن لە ئایەتێکی تردا ئەفەرموێت: ﴿فَأَذَاقَهَا اللَّهُ لِبَاسَ الْجُوعِ وَالْخَوْفِ﴾[1] خودا بەو هۆیەوە بەرگی برسیەتی‌و ترسی کردە پۆشاکی خەڵکەکەی. دیارە ترس‌و برسیەتی هەردووکیان بەخەڵکیەوە دەردەکەوێ، بۆیە خودای گەورە فەرموویەتی پۆشاکی ترس‌و برسیەتی. لێرەیشدا ئەفەرموێت: ﴿ وَلَنَبْلُوَنَّكُم بِشَيْءٍ مِّنَ الْخَوْفِ وَالْجُوعِ وَنَقْصٍ مِّنَ الْأَمْوَالِ وَالْأَنفُسِ وَالثَّمَرَاتِ ﴾ دیارە ئێمە جاروبار بە هەندێك ترس‌و برسی بوون‌و لەناوچوون وکەم بوونەوەی ماڵی دنیاو بەروبوومتان تاقیتان دەکەینەوە. بە برسیەتی‌و ترس‌و ماڵ لە دەست چوون‌و مردنی خێزان‌و کەس‌وکارو خۆشەویست‌و بە نەهاتنی بەروبووم‌و کشتوکاڵەکانتان). پاشان خودای گەورە ئەفەرموێت: ﴿وَبَشِّرِ الصَّابِرِينَ﴾ مژدە بدە بەو کەسانەی خۆڕاگرن. پاشان خودای مەزن باسی هەندێ لەو خۆڕاگرانە دەکات کە ڕێزیان لێ دەنێ ﴿الَّذِينَ إِذَا أَصَابَتْهُم مُّصِيبَةٌ قَالُوا إِنَّا لِلَّهِ وَإِنَّا إِلَيْهِ رَاجِعُونَ﴾ ئەو کەسانەی کە تووشی بەڵایەك دێن ئەڵێن: ئێمەش هەر هی خواین‌و هەر بۆ لای ئەو دەچینەوە. واتە: بەو شێوەیە دڵخۆشی خۆیان ئەدەنەوە لەوەی کە تووشیان هاتوە، دەزانن ئەوانیش هەر موڵکی خودان‌و بە ویستی خۆی کاری عەبدەکانی خۆی بەڕێ دەکا. دەشزانن کە خودا بە ئەندازەی گەردیلەیەك هیچ شتێ زایە ناکا لە ڕۆژی قیامەتا. دانی پێدادەنێن کە ئەوانیش بەندەی خودان‌و هەر دەگەڕێنەوە بۆ لای ئەو لە ڕۆژی دواییدا. هەر بۆیە خودای گەورەلەسەرئەوە پاداشتی چاکیان ئەداتەوە: ﴿أُولَٰئِكَ عَلَيْهِمْ صَلَوَاتٌ مِّن رَّبِّهِمْ وَرَحْمَةٌ﴾ خێرو بێرو بەزەیی پەروەردگاریان بۆ دەبارێ. واتە: خودا وەسفیان دەکات‌و بەزەیی خۆی بەسەریاندا دەبارێنێ. سەعیدی کوڕی جوبەیر دەڵێت: لەوەدڵنیایان دەکات کەسزانادرێت[2]. ﴿وَأُولَٰئِكَ هُمُ الْمُهْتَدُونَ﴾ شارەزا لە ڕیگاش ئەوانن. عومەری کوڕی خەتاب دەڵێت: بەڵێ.(العِدلان) واتە: دوو پاداشت زیادەیەکیش ﴿أُولَٰئِكَ عَلَيْهِمْ صَلَوَاتٌ مِّن رَّبِّهِمْ وَرَحْمَةٌ﴾ خێرو بێرو بەزەیی دوو چاکەکەیە ﴿وَأُولَٰئِكَ هُمُ الْمُهْتَدُونَ﴾ شارەزایش لە ڕێگە هەر ئەوانن. ئەمەیش زیادەکەیە.[3] کە لەسەر دوو پاداشتەکە دادەنرێ‌و سەنگینی دەکا. ئا بەو جۆرە ئەوانە پاداشتی خۆیان وەردەگرن‌ودیسان زیادیش دەکرێ. بۆیان

[1] النحل(١١٢).

[2] ابن ابي حاتم غ: (١٥٨/١).

[3] الحاكم(٢٢٠/٢).

## گەورەيى وتنى(إنا لله و إنا إليه راجعون ) لەكاتى تووش بوونى بەلادا

دەربارەى پاداشتى ئەم دەقە كە خوداى مەزن ئەفەرمويّت: ﴿إِنَّا لِلَّهِ وَإِنَّآ إِلَيۡهِ رَٰجِعُونَ﴾ ئيمە هەر هى خوداين‌و هەر بۆلاى ئەو دەچينەوە. لە كاتى تووش بوونى بەلادا. فەرموودە زۆرە، لەو فەرموودانە، ئيمامى ئەحمەد ريوايەتى كردوە لە ئوموسەلەمەوە دەلّيت: باوكى سەلەمە رۆژىّ هاتە لام كە لەلاى پيّغەمبەرى خودا(ﷺ) هاتەوە، دەلّيت: قسەيەكم بيست لە پيّغەمبەرى خودا(ﷺ) پيّى دلّخۆش بووم. فەرمووى: (هيچ موسولّمانىّ تووشى بەلايەك نابىّ بەلاكەدا كە تووشى هات(إنا لله و إنا إليه راجعون) بلّىّ‌و پاشانيش بلّىّ: ئەى خودايە پاداشتم بدەرەوە لەسەر ئەم بەلايە كە تووشم هاتوە چاكترم لە جيّى ئەوە بۆ دابنىّ، بىّ گومان ئەوەى بۆ كراوە). ئوموسەلەمە دەلّيت: ئەوەم ليّوە لەبەر كرد. كاتىّ كە ئەبوسەلەمە كۆچى دوايى كرد(إنا لله و إنا إليه راجعون)م كردو، وتم: ئەى خودايە پاداشتم بدەرەوە لەم بەلايەدا(كە تووشم هاتووە) چاكترم لە جيّى ئەو بۆ دابنىّ. پاشان دلّى خۆمداتاوتويّم دەكردو وتم: لە كوىّ من چاكترم لە ئەبوسەلەمە بۆ دەبىّ؟ پاش ئەوەى ماوەى شەرعيم تەواوبووپيّغەمبەرى خودا(ﷺ) ئيزنى لىّ خواستم، خەريكى خۆشە كردنى پيّستەيەكى خۆم بووم، دەستم شۆرى(من القرظ) لەو شتەى كە پيّم خۆشە دەكرد، ئيزنم پيّدا. پالّپشتيّكى چەرمم بۆ راخست كە ناوەخنەكەى پيشالّ بوو، لەسەرى دانيشت‌و خوازبيّنى لىّ كردم، كاتىّ كە قسەكانى تەواو كرد، وتم: ئەى پيّغەمبەرى خودا(ﷺ) من خۆم بەوە نابينم كە حەزم لە تۆ بىّ(ما بي أن لا يكون بك رغبة)، من ژنيّكم پەرۆشم(غيرة)، زۆرە،دەترسم شتيّكم تيّدا ببينى بەهۆيەوە خودا سزام بدات، من ئافرەتيّكم تەمەنيشم كردوەو خاوەن مندالّم، پيّغەمبەرى خودا(ﷺ) فەرمووى: (ئەوەى كە باست كرد دەربارەى پەرۆشى(غيرة) خوداى مەزن بەو زووانە لەسەرتى لادەبات، ئەويش كە وتت دەربارەى تەمەن، ئەوەى تووشى تۆ هاتووە، تووشى منيش هاتووە، ئەوەيش لە باست كرد دەربارەى بەخيّو كردنى مندالّ بيّگومان مندالّى تۆ مندالّى منيشە(إنما عيالك عيالي)) دەلّيّت: خۆى تەسليمى پيّغەمبەرى خودا كرد، پيّغەمبەرى خودا(ﷺ) مارەى كرد، پاشان ئوموسەلەمە دەلّيت: خودا ئەبوسەلەمەى بۆ گۆرِيم بە چاكتر لەو. كە پيّغەمبەرى خودايە(ﷺ)[1] هەر بەمجۆرە بە كورتى لە سەحيحى موسليما ئەم فەرموودەيە هاتووە[2].

﴿إِنَّ ٱلصَّفَا وَٱلۡمَرۡوَةَ مِن شَعَآئِرِ ٱللَّهِۖ فَمَنۡ حَجَّ ٱلۡبَيۡتَ أَوِ ٱعۡتَمَرَ فَلَا جُنَاحَ عَلَيۡهِ أَن يَطَّوَّفَ بِهِمَاۚ وَمَن تَطَوَّعَ خَيۡرٗا فَإِنَّ ٱللَّهَ شَاكِرٌ عَلِيمٌ ﴿١٥٨﴾﴾

---

[1] أحمد(٢/٢٧)، فەرموودەيەكى باشە(جيد).

[2] مسلم(٦٣٣/٢).

**کەسێ تەوافی کرد لەنێوان سەفاو مەرودا گوناهی ناگات**

ئیمامی ئەحمەد ڕیوایەتی کردوە لە عوروەوە،لە عائیشەوە، دەڵێت: وتم: ئایا نەتبینیوە کە خودای گەورە ئەفەرموێت: ﴿إِنَّ ٱلصَّفَا وَٱلْمَرْوَةَ مِن شَعَآئِرِ ٱللَّهِ فَمَنْ حَجَّ ٱلْبَيْتَ أَوِ ٱعْتَمَرَ فَلَا جُنَاحَ عَلَيْهِ أَن يَطَّوَّفَ بِهِمَا﴾ سەفاومەروە دوو دروشمی ئاینی خوا پەرستین، هەرکەسێ دەچێتە زیارەتی ماڵی خودا یان عەمرە بەجێ دەهێنێ، ئەگەر تەوافی ئەو دوانەش بکات گوناهێکی نیە. عوروە وتی: وتم: سوێند بە خوا ئەو کەسەی حەج دەکات تاوانی لەسەر نیە لەنێوان سەفاو مەروەشدا هاتوچۆ نەکا. عائیشە دەڵێت: ئەی خوشکەزای خۆم شتێکی زۆر خراپت وت. ئەگەر وا بوایە تۆ مانات کرد دەبو بەم جۆرە بێت ﴿فَلَا جُنَاحَ عَلَيْهِ أَن يَطَّوَّفَ بِهِمَا﴾ بەلام ئەم ئایەتە بۆیە هاتەخوارەوە چونکە ئەنسارەکان پێش ئەوەی موسوڵمان ببن حەج‌و تەلبیەیان لای مەنات ی گومڕا دا بوو کە دەیانپەرست،جا هەرکەسێك ئەم کارەی کردبێ پێی ناخۆش بوو لەنێوان سەفاو مەروەدا بێت‌و بچێت. پرسیاری ئەوەیان لە پێغەمبەری خودا(ﷺ) کردو وتیان: ئەی پێغەمبەری خودا(ﷺ) ئێمە لە کاتی نەفامییدا پێمان گران بوو لەنێوان سەفاو مەروەدا بێین‌و بچین، خودای گەورە ئەم ئایەتەی ناردەخوارەوە ﴿إِنَّ ٱلصَّفَا وَٱلْمَرْوَةَ مِن شَعَآئِرِ ٱللَّهِ فَمَنْ حَجَّ ٱلْبَيْتَ أَوِ ٱعْتَمَرَ فَلَا جُنَاحَ عَلَيْهِ أَن يَطَّوَّفَ بِهِمَا﴾ عائیشە دەڵێت: پاشان پێغەمبەری خودا(ﷺ) بڕیاری هاتوچۆی دا لەنێوانیاندا، هیچ کەسێکیش بۆی نیە واز لەو هاتوچۆیە بێنێ بوخاری و موسلمیش لە هەردوو سەحیحەکەیاندا هێناویانە. لە ڕیوایەتێکیشدا لە زوهریەوە هاتوە دەڵێت: ئەم قسەیەم کرد بۆ ئەبوبەکری کوڕی عەبدوڕەحمانی کوڕی حارسی کوڕی هیشام. ئەویش دەڵێت: ئەم زانیاریەم تا ئێستا نەبیستووە. لە هەندێ پیاوی زانام بیستووە کە دەڵێن: خەلکی(جگە لە عائیشە) دەڵێن: ئەم تەوافەمان لە نێوان ئەم دوو بەردەدا لە کاری نەفامیە. هەندێکیش لە ئەنسارەکان وتیان: ئێمە فەرمانمان پێکراوە بە تەواف کردن بە دەوری بەیتا(کەعبە)، فەرمانمان پێ نەکراوە بە تەواف کردن لە نێوان سەفاو مەروەدا، خودای گەورە ئەم ئایەتەی نارده خوارەوە: ﴿إِنَّ ٱلصَّفَا وَٱلْمَرْوَةَ مِن شَعَآئِرِ ٱللَّهِ﴾ سەفاو مەروە لە دروشمەکانی خودان. ئەبوبەکری کوڕی عەبدوڕەحمان دەڵێت: لەوانەیە لەسەر ئەوانەو ئەوانەیش هاتبێتە خوارەوە،[1] بوخاریش بەم جۆرە ڕیوایەتی کردوە لە ئەنەسەوە. شەعبی دەڵێت: بتی(ئیساف) لەسەر سەفا بوو نائیلەشلە سەر مەروە بوو. دەستیان پێدا دەهێنان یان ماچیان دەکردن، دوای موسوڵمان بوو پێیان ناخۆش بوو کە لە نێوانیانداتەواف بکەن،جا ئەوئایەتە هاتە خوارەوە.

---

[1] فتح الباري(٣/٥٨١)، مسلم(٢/٩٢٩).

## حوکمی هات وچۆلەکوێوەهاتووە؟

لەسەحیحی موسلیمدا هاتوە لە فەرمودە درێژەکەی جابیردا، کە پێغەمبەری خودا(ﷺ) کاتێ کەلێبووە وەلە تەواف،گەڕایەوە بۆ(ڕوکن) و دەستی پێدا هێناو لە دەرگای سەفاوە دەرچوو ئەیفەرموو: ﴿إِنَّ ٱلصَّفَا وَٱلۡمَرۡوَةَ مِن شَعَآئِرِ ٱللَّهِۖ﴾ بێگومان سەفاو مەروا لە دروشمەکانی خودان. پاشان فەرمووی: (دەست بکە بەوەی کە خودا دەستی پێکردووە) لە ڕیوایەتی نەسائیدا هاتووە: (دەست بکە بەوەی کە خودا دەستی پێکردووە)[1]، ئیمامی ئەحمەد ڕیوایەتی کردوە لە حەبیبەی کچی ئەبوتەجراتەوەدەڵێت: پێغەمبەری خودام بینیووە(ﷺ) تەوافی دەکرد لەنێوان سەفاو مەروادا، خەڵکی لەلایدا بوون‌و ئەو بە دوایانەوە بوو، هەتا ئەژنۆیم دەبینی، ئەوەندە بە پەلە دەڕۆشت، پۆشاکەکەی لێی دەپێچراو دەیفەرموو: (ڕۆشتنی بەپەلەبکەن بێگومان خودا ڕۆشتنی پەلەی لەسەرفەرزکردوون)[2]، ئەم فەرموودەیە کراوە بە بەڵگە کە هاتوچۆ لەنێوان سەفا و مەروەدا ڕوکنێکە لە حەج. وتراویشە: هاتوچۆ لەنێوان سەفاو مەروەدا واجیبە(ڕوکن) نیە، ئەگەر کەسێ بە ئەنقەست یان بە هەڵە نەیکرد بە خوێنێ کەفارەتی دەکاتەوە. وتراویشە: موستەحەبە. بەڵام دروست تر ئەوەیە کە ڕوکنە یان واجیبە. خودای گەورە ڕوونی کردۆتەوە لە هاتوچۆ لەنێوان سەفاو مەروەدا لە دروشمەکانی خودایەو خودای گەورە دایناوە بۆ ئیبراهیم لە دروشمی حەجدا. لە فەرموودەکەی ئیبنوعەباسدا لە پێشەوە باس کرا ئەمە لە تەوافەکەی هاجەرو هاتوچۆکەیەوە لەنێوان سەفاو مەروەدا وەرگیراوە، لە گەڕان بە شوێنی ئاودا بۆ کوڕەکەی، کاتێ کە ئاووخواردنەکەی تەواو بوو، کاتێ کە ئیبراهیم لەوێ بەجێی هێشت(سەلامی خوای لێ بێ) کە هیچ کەسی لەلا نەبوو. ترسا لەوەی منداڵەکەی لەناو بچێ،لەوێدا هەرچیان لەلا بوو تەواو بوو، هەڵساو داوای یارمەتی لە خودای مەزن دەکرد، لەو شوێنە پیرۆزەدا لەنێوان سەفاو مەروەدا.بەردەوام هاتوچۆیدەکرد دەڵێن خۆی دەنواندو بە ترس‌و لەرزو هەژاریەوە لە خودای گەورە دەپاڕایەوە، هەتا خودای مەزن ئەو نارەحەتیەی لەسەر لابردو دەروی لێکردەوەو ئاوی زەمزەمی بۆ هەڵقوڵاند کە(خۆراکە بۆ کەسێ بیخوات‌و شیفایشە بۆ نەخۆش)،ئەو کەسەی کە هاتوچۆ دەکات لەنێوانیاندا دەبێ هەژاری‌و زەلیلی‌و پێویستی خۆی دەرخات‌و بپاڕێتەوە لە خودا کە دڵی شارەزا بکاو ژیانی چاك بکاو لە گونەهەکانی خۆش ببێ، یان هانای پێ بەرێت کە چاوپۆشی لە کەم‌و کوڕی‌و عەیبەکانی بکات‌و شارەزای بکات بۆ سەر ڕاستەڕێ‌و

---

[1] أحمد(٢/٨٨٦)، النسائي(٥/٢٣٩)، سەحیحە.

[2] أحمد(٦/٤٢١)، فەرموودەیەکی حەسەنە.

ڕاوەستاوی بکات لەسەری هەتا دەمرێت، وە ئەوژیانەی بگوزەرێ کە لەسەریەتی لە گوناهو تاوان‌و بۆ ژیانێکی چاك‌و ڕێك‌و پێك‌و تەواو دوور لە تاوان‌و خراپە. وەك چۆن بۆ هاجەر کرا(سەلامی خوای لێ بێ).

پاشان خودای گەورە ئەفەرموێت: ﴿وَمَن تَطَوَّعَ خَيْرًا﴾ هەرکەسێکیش بە ویستی دڵی خۆی ئەو کارە بکا. وتراوە: هەرکەسێ زیاتر لە واجبی کرد لە هات‌وچۆ لەنێوان سەفاو مەروەدا هەشت‌و نۆجار زیاتریش. وتراویشە لەنێوانیانداتەواف بکات لەحەج عومرەی(تَطوع)دا وتراویشە: مەبەست ئەوەیە بە ویستی خۆی هەر خێرێ بکات لە عیبادەتەکانی تریشدا.( ڕازیی) ئەمەی گێڕاوەتەوە، حەسەنی بەسریش پشتگیری لەو ڕایە کردوە[1] ﴿فَإِنَّ اللَّهَ شَاكِرٌ عَلِيمٌ﴾ بێگومان خودا پێ زانەو لە ئاکارەکەی ئاگادارە. واتە: پاداشت لەسەر کەم‌و زۆریش ئەداتەوە، ئەندازەی ئەو پاداشتەش دەزانێ و پاداشتی هیچ کەس کەم ناکاتەوە ﴿إِنَّ اللَّهَ لَا يَظْلِمُ مِثْقَالَ ذَرَّةٍ وَإِن تَكُ حَسَنَةً يُضَاعِفْهَا وَيُؤْتِ مِن لَّدُنْهُ أَجْرًا عَظِيمًا﴾[2] خودا بە سەنگی مێروولەی وردیلەش ناهەقی لە هیچ کەس ناکا. بەڵام بەرانبەر بە هەر چاکەیەك کە بیکەن دوو ئەوەندە پاداشت ئەدات، سەرەڕای ئەو پاداش دانەوەیش، خەڵاتی گرنگیان هەیە.

﴿إِنَّ الَّذِينَ يَكْتُمُونَ مَا أَنزَلْنَا مِنَ الْبَيِّنَاتِ وَالْهُدَىٰ مِن بَعْدِ مَا بَيَّنَّاهُ لِلنَّاسِ فِي الْكِتَابِ ۙ أُولَٰئِكَ يَلْعَنُهُمُ اللَّهُ وَيَلْعَنُهُمُ اللَّاعِنُونَ (١٥٩) إِلَّا الَّذِينَ تَابُوا وَأَصْلَحُوا وَبَيَّنُوا فَأُولَٰئِكَ أَتُوبُ عَلَيْهِمْ ۚ وَأَنَا التَّوَّابُ الرَّحِيمُ (١٦٠) إِنَّ الَّذِينَ كَفَرُوا وَمَاتُوا وَهُمْ كُفَّارٌ أُولَٰئِكَ عَلَيْهِمْ لَعْنَةُ اللَّهِ وَالْمَلَائِكَةِ وَالنَّاسِ أَجْمَعِينَ (١٦١) خَالِدِينَ فِيهَا ۖ لَا يُخَفَّفُ عَنْهُمُ الْعَذَابُ وَلَا هُمْ يُنظَرُونَ (١٦٢)﴾

## ئەفرینی بەردەوام بۆ ئەو کەسانەی کە فرمانە ئا ینیەکانیان شاردۆتەوە

﴿إِنَّ الَّذِينَ يَكْتُمُونَ مَا أَنزَلْنَا مِنَ الْبَيِّنَاتِ وَالْهُدَىٰ مِن بَعْدِ مَا بَيَّنَّاهُ لِلنَّاسِ فِي الْكِتَابِ ۙ أُولَٰئِكَ يَلْعَنُهُمُ اللَّهُ وَيَلْعَنُهُمُ اللَّاعِنُونَ﴾ ئەو کەسانەی ئەو شتانە لەم کتێبەدا هەیەو بۆ شارەزایی مەردمە لە پاش ئەوەی ناردوومانەتە خوارەوە، لەخەڵکی دەشارنەوە، وەبەر نەفرینی خوداو هەموو نەفرین کەران بکەون. ئەمە هەڕەشەیەکی زۆر توندە لەو کەسانەی ئەو شتانە دەشارنەوە کە پێغەمبەران هێناویانە لەو بەڵگەو نیشانە ئاشکرایانەو لەو مەبەستە ڕاست‌و ڕێنماییە بەسوودانە بۆ دڵەکان. دوای ئەوەی کە خودای مەزن ڕوونی کردۆتەوە بۆ عەبدەکانی لەو کتێبانەدا کە بۆ پێغەمبەرەکانی.ڕوانەی کردون ئەبولعالیە دەڵێت: ئەم ئایەتە لەسەر ئەهلی کتێب هاتۆتە خوارەوەکاتێ کە لە سیفەتەکانی

---

[1] الرازي(٤/١٤٦).

[2] النساء(٤٠).

موحەممەدیان(ﷺ) شاردبوەوە.[1] پاشان فەرموویەتی ئەوانە هەموو شتێ نەفرینیان لێ دەکات لەسەر ئەو کارەیان. وەك چۆن زانایان هەموو شتێ داوای لێخۆشبوونیان بۆ دەكات هەتا ماسیش لە دەریاداو باڵندەیش لە هەوادا، بەڵام ئەمانە بە پێچەوانەی زاناوە خوداو نەفرینکەران، نەفرینیان لێ دەکەن. لەم فەرموودەو موسنەدانەدا هاتووە کە چەند رێگاوە لە پشتگیری یەکتری دەکەن لە ئەبوهورەیرەو کەسانی تریشەوە کە پێغەمبەری خودا(ﷺ) فەرموویەتی: (کەسێ پرسیاری لێ کرابێ لە زانیارییەك شاردبێتیەوە(لە رۆژی قیامەتا بە لەغاوێك لەئاگر[2] لەغاودەکرێ)، لە فەرموودەیەکی سەحیحدا هاتووە لە ئەبوهورەیرەوە دەڵێت: ئەگەر ئەو ئایەتە نەبوایە لە کتێبی خوادا هیچ شتێکم بۆ کەس باس نەدەکرد. ﴿ إِنَّ ٱلَّذِينَ يَكۡتُمُونَ مَآ أَنزَلۡنَا مِنَ ٱلۡبَيِّنَٰتِ وَٱلۡهُدَىٰ ﴾ ئەو کەسانەی ئەو شتانە لەم کتێبەدا هەیەو بۆ شارەزایی مەردمە ناردومانەتە خوارەوە لە خەڵکی دەشارنەوە[3]. موجاهید دەڵێت: کاتێ قاتیو قڕی زەوی داگرت، گیانەوەران دەڵێن: ئەمە لەبەر تاوانباری نەوەی ئادەمە، نەفرین لە یاخیو تاوانبارانی نەوەی ئادەم[4]. ئەبولعالیەو رەبیعی کوڕی و ئەنەسو قەتادەوتویانە: ﴿وَيَلۡعَنُهُمُ ٱللَّٰعِنُونَ﴾ واتە: فریشتەکانو خاوەنباوەڕان نەفرینیان لێدەکەن[5] لەم فەرمودەشدا هاتووە: (بێگومان هەموو شتێ داوای لێبوردن بۆزانا دەکات تەنانەت ماسیش لە دەریادا). هەرلەم ئایەتەدایە هاتووە،ئەوانەی زانیاری دەشارێتەوە خوداو فریشتەکانو هەموو خەڵکی نەفرینیان لێ دەکەن.و هەتا نەفرین کەرانیش لە هەموو زمان پاراون و کەئەوانەش ناتوانن باش نەفرینیان لێ بکەن، بە زمانی قسەکردن یان بە زمانی حاڵ ئەگەر ئاوەزیان هەبوایە، هەروەها لە رۆژی قیامەتیشدانەفرینیان لێدەکەن(والله أعلم.) پاشان خودای مەزن ئەوانەی جیا کردۆتەوە کە پەشیمان دەبنەوەو دەگەرێنەوە بۆ لایو ئەفەرموێت: ﴿ إِلَّا ٱلَّذِينَ تَابُواْ وَأَصۡلَحُواْ وَبَيَّنُواْ ﴾ جیا لەوانەی پاشان پەشیمان دەبنەوەو ئاکاری چاکیان پەچاو کردو شاردویان ئاشکرا کرد. واتە: ئەوانەی ئەوان شاردیانەوە ئەمان ئاشکرایان کرد ﴿فَأُوْلَٰٓئِكَ أَتُوبُ عَلَيۡهِمۡ وَأَنَا ٱلتَّوَّابُ ٱلرَّحِيمُ﴾ لەوانەی پەشیمان دەبنەوە خۆش دەبم، هەر منیشم لەوانە پەشیمان دەبنەوە دەبورم و دلۆڤانم. ئەم ئایەتە بەڵگەیە لەسەر ئەوە، ئەوانەی کە بانگەواز دەکەن بۆ خوانەناسی یان شتێ

---

[1] ابن ابي حاتم غ: (١/١٧٠).

[2] أحمد(٢/٤٩٥)، فەرموودەیەکی حەسەنە.

[3] فتح الباري(١/٢٥٨).

[4] ابن ابي حاتم غ: (١/١٧٥).

[5] ابن ابي حاتم غ: (١/١/١٧٤).

دادەهێنن کە لە ئاینی خودا نیە کاتێ تەوبەیان کردو پەشیمان بونەوە خودا تەوبەکەیان لێ قبوول دەکات. پاشان باسی ئەوانە دەکات کە خوانەناسن و بەردەوام دەبن لەسەر ئەو خوانەناسیە هەتا دەمرن و ئەفەرموێت: ﴿إِنَّ ٱلَّذِينَ كَفَرُواْ وَمَاتُواْ وَهُمْ كُفَّارٌ أُوْلَٰٓئِكَ عَلَيْهِمْ لَعْنَةُ ٱللَّهِ وَٱلْمَلَٰٓئِكَةِ وَٱلنَّاسِ أَجْمَعِينَ ﴿١٦١﴾ خَٰلِدِينَ فِيهَا﴾ ئەوانەی بوونە خوانەناس‌و بە خوانەناسی لە دنیا دەرچوون‌و مردن، دەکەونە بەر نەفرینی خوداو فریشتەکان‌و هەموو خەڵکی، هەتا هەتایە تێیدا دەمێننەوە. واتە: هەتا ڕۆژی قیامەت ئەو نەفرینە بەردەوام بۆیان دەڕوات پاشان لەناو ئاگریشا هەر لەگەڵیەتی ﴿لَا يُخَفَّفُ عَنْهُمُ ٱلْعَذَابُ﴾ ئازاریشیان هیچ سووک ناکرێ ﴿وَلَا هُمْ يُنظَرُونَ﴾ وچانیشیان پێ نادرێ. واتە: تەنیا ساتێك ئەو سزایەیان لەسەر کەم ناکرێتەوە، بەڵکو بەردەوام هەر جەزرەبە ئەدرێن(پەنا دەگرین بە خودای گەورە لەو ئاگرە).

### دروستە نەفرین لە خوانەناسان بکرێ

لەنێوان زانایاندا ناکۆکی نیە لەسەر دروستی نەفرین کردن لە خوانەناسان. عومەری کوڕی خەتاب(ڕەزای خوای لێ بێ) پێشەوایانە دوای خۆیشی نەفرینیان کردوە لە خوانەناسان لە قونوت خوێندنداو لە کاتی تریشدا. بەڵام کەسێکی خوانەناسی دیاری کراو، کۆمەڵێ لە زانایان دەڵێن کەسی وا نەفرینی لێ ناکرێ، چونکە ئێمە نازانین خودا کۆتایی ژیانی بەچی دێنێ موسوڵمان دەبێ یان بە خوانەناسی دەمرێ، دەستەیەکی تر دەڵێن: دروستە نەفرین لێ کردنی خوانەناسێکی دیارو تایەبەتیش. لە بەسەرهاتی ئەو کەسەی کە بە سەرخۆشی هێنرا کە قامچی لێ بدرێت، پیاوێ دەڵێت: نەفرینی خوای لێ بێ، ئەمە چەند جار بە سەرخۆشی هێناویانە. پێغەمبەری خودا(ﷺ) فەرمووی: (نەفرینی لێ مەکە چونکە ئەمە خوداو پێغەمبەرەکەی خۆش دەوێ)[1]، ئەم فەرمودەیە بەڵگەیە لەسەر ئەوەی کە(محمد،ص)ڕەحمەتەن(للعالمین)ە....

﴿وَإِلَٰهُكُمْ إِلَٰهٌ وَٰحِدٌ لَّآ إِلَٰهَ إِلَّا هُوَ ٱلرَّحْمَٰنُ ٱلرَّحِيمُ ﴿١٦٣﴾﴾

﴿وَإِلَٰهُكُمْ إِلَٰهٌ وَٰحِدٌ لَّآ إِلَٰهَ إِلَّا هُوَ ٱلرَّحْمَٰنُ ٱلرَّحِيمُ﴾ خودای ئێوە هەر خودای تاك‌و تەنیایە، جگە لەو هیچ شت بۆ پەرستن ناشێ، هەر بۆ خۆشی دەهەندەو دلۆڤانە. خودای گەورە باسی تاك‌و تەنیایی خۆی دەکا. کە شەریك‌و هاوتای نیەو بێ نیازەو جێی نیازەو هیچ پەرستراوێك نیە جگە لەئەوو خودایەکی دەهەندەو دلۆڤانە. لە تەفسیری سورەتی فاتیحەدا لە پێشەوە باسی ئەو دوو ناوە مەزنە کراوە. لەم فەرموودەیەشدا لە شەهری کوڕی هەوشەبەوە لە ئەسمای کچی یەزیدی کوڕی سەکەنەوە

---

[1] عبدالرزاق(٣٨١/٧)، فەرمودەیەکی سەحیحە.

لە پێغەمبەری خوداوە(ﷺ) کە فەرموویەتی: (ناوە هەرە گەورەکان(الاسم الاعظم) لەم دوو ئایەتەدایە ﴿وَإِلَٰهُكُمْ إِلَٰهٌ وَاحِدٌ لَّا إِلَٰهَ إِلَّا هُوَ الرَّحْمَٰنُ الرَّحِيمُ﴾ خودای ئێوە هەر خودای تاکو تەنیایە، جگە لەو هیچ شتێ بۆ پەرستن ناشێ، هەر خودا خۆی دەهەندەو دلۆڤانە. ﴿الٓمٓ ۞ اللَّهُ لَا إِلَٰهَ إِلَّا هُوَ الْحَيُّ الْقَيُّومُ﴾ الیف، لام، میم، جگە لە خودا هیچ شت بۆ پەرستن ناشێ، هەر زیندوەو بەسەر هەموو شت ڕادەگا.[1]

پاشان باسی بەڵگەی زۆری کردوە لەسەر تاکو تەنیایی خودا بە دروست کردنی ئاسمانەکانو زەمینو ئەوەی تێیاندایەو لە نێوانیشیاندایە لەو هەموو دروستکراوانەی تریش کە هەیەو لە ژمارە نایەت. کە هەموو بەڵگەن لەسەر تاکو تەنیایی خودای مەزن.

﴿إِنَّ فِي خَلْقِ السَّمَاوَاتِ وَالْأَرْضِ وَاخْتِلَافِ اللَّيْلِ وَالنَّهَارِ وَالْفُلْكِ الَّتِي تَجْرِي فِي الْبَحْرِ بِمَا يَنفَعُ النَّاسَ وَمَا أَنزَلَ اللَّهُ مِنَ السَّمَاءِ مِن مَّاءٍ فَأَحْيَا بِهِ الْأَرْضَ بَعْدَ مَوْتِهَا وَبَثَّ فِيهَا مِن كُلِّ دَابَّةٍ وَتَصْرِيفِ الرِّيَاحِ وَالسَّحَابِ الْمُسَخَّرِ بَيْنَ السَّمَاءِ وَالْأَرْضِ لَآيَاتٍ لِّقَوْمٍ يَعْقِلُونَ ۞١٦٤﴾

## نیشانەکانی تاكو تەنیایی خودای مەزن

﴿إِنَّ فِي خَلْقِ السَّمَاوَاتِ وَالْأَرْضِ﴾ لە دروستکردنی ئاسمانەکانو زەمین، واتە: ئەو ئاسمانە بەو بەرزیو جوانیو فراوانیو ئەستێرە گەڕۆكو وەستاوانەوەو سوڕانەوەی گەردوونەکانی یەوەو ئەم زەمینەش بەو چڕیو بەرزیو نزمی یەوە، کێوو دەریاو بیابان و ئەو هەموو ئاوەدانیەو بەرهەمە بەسوودەیەوە ﴿وَاخْتِلَافِ اللَّيْلِ وَالنَّهَارِ﴾بەویە هاتوچۆی شەوو ڕۆژ،ی کە شەو دێتو پاشان دەڕواتو ڕۆژ بە دوایدا دێتو دەڕوات، تەنیا یەك سات لێی دواناکەوێ، وەك خودای مەزن ئەفەرموێت: ﴿لَا الشَّمْسُ يَنبَغِي لَهَا أَن تُدْرِكَ الْقَمَرَ وَلَا اللَّيْلُ سَابِقُ النَّهَارِ ۚ وَكُلٌّ فِي فَلَكٍ يَسْبَحُونَ﴾[2] نە خۆر توانای ئەوەی هەیە بگابە مانگو نەشەویش پێش ڕۆژدەکەوێ. هەمووشیان لە ئاسمانێك مەلە دەکەن. جاری شەو درێژ دەبێو جاری ڕۆژ کورت دەبێ،جارێکی تر بە پێچەوانە،و لە یەکتری کەم دەکەنەوەو زیادی دەکەن. ﴿يُولِجُ اللَّيْلَ فِي النَّهَارِ وَيُولِجُ النَّهَارَ فِي اللَّيْلِ﴾[3] شەو لە ڕۆژ هەڵدەکێشێو ڕۆژیش دەخاتە ناو شەو ﴿وَالْفُلْكِ الَّتِي تَجْرِي فِي الْبَحْرِ بِمَا يَنفَعُ النَّاسَ﴾ ئەو کەشتیانەی لەناو دەریادا دەگەڕێن بەهرەیان بۆخەڵك هەیە. واتە: دەریای ڕام هێناوە کەشتیەکان هەڵگرێ لە لایەکەوە بۆ لایەکی تر بۆ

---

[1] أبوداود(٢/١٦٨)، فەرموودەیەکی حەسەنە.

[2] يس(٤٠).

[3] الحج(٦١).

بەدەست هێنانی بژێوی خەڵکی‌و سوود گەیاندن پێیان لە کیشوەرەکاناو گواستنەوەی شمەکەکانیان بۆ لای یەکتری. ﴿وَمَآ أَنزَلَ ٱللَّهُ مِنَ ٱلسَّمَآءِ مِن مَّآءٍ فَأَحْيَا بِهِ ٱلْأَرْضَ بَعْدَ مَوْتِهَا﴾ لەو ئاوەی خوا لە ئاسمانەوە دەیبارێنێ کە ئەو زەمینەی لەپاش مردنی زیندوو کردۆتەوە وەك خودای گەورە لە ئایەتێکی ترا ئەفەرموێت: ﴿وَءَايَةٌ لَّهُمُ ٱلْأَرْضُ ٱلْمَيْتَةُ أَحْيَيْنَٰهَا وَأَخْرَجْنَا مِنْهَا حَبًّا فَمِنْهُ يَأْكُلُونَ ﴿٣٣﴾ وَجَعَلْنَا فِيهَا جَنَّٰتٍ مِّن نَّخِيلٍ وَأَعْنَٰبٍ وَفَجَّرْنَا فِيهَا مِنَ ٱلْعُيُونِ ﴿٣٤﴾ لِيَأْكُلُوا۟ مِن ثَمَرِهِۦ وَمَا عَمِلَتْهُ أَيْدِيهِمْ أَفَلَا يَشْكُرُونَ ﴿٣٥﴾ سُبْحَٰنَ ٱلَّذِى خَلَقَ ٱلْأَزْوَٰجَ كُلَّهَا مِمَّا تُنۢبِتُ ٱلْأَرْضُ وَمِنْ أَنفُسِهِمْ وَمِمَّا لَا يَعْلَمُونَ﴾[1] هەر لە زەوی ڕابمێنن نیشانەی بۆ ئەوان تێدایە: بە مردوویی زیندوومان کردەوەو دەنکمان لێ بەرهەم هێنا کە خۆراکە بۆ ئەمانە. هەتاپێدەکات. چ لەوانەشی کە نایزانن.

پاشان لێرەدا ئەفەرموێت: ﴿وَبَثَّ فِيهَا مِن كُلِّ دَآبَّةٍ﴾ هەموو جۆرە زیندەوەری تێدا بڵاو کردۆتەوە. بە جیاوازی شێوەو ڕەنگو سودی‌و گەورەیی‌و بچووکی، خودا ئاگای لە هەموویەتی‌و ڕۆزیشی ئەدات‌و هیچی لێ ون نابێ لەوانە، وەك ئەفەرموێت: ﴿وَمَا مِن دَآبَّةٍ فِى ٱلْأَرْضِ إِلَّا عَلَى ٱللَّهِ رِزْقُهَا وَيَعْلَمُ مُسْتَقَرَّهَا وَمُسْتَوْدَعَهَا ۚ كُلٌّ فِى كِتَٰبٍ مُّبِينٍ﴾[2] لەم زەمینە هەر شتێ دەجوڵێتەوە گشتی ڕۆزی لەسەر خودایە، دەزانێ بنکەی لە کوێ یەو لە کوێدا خۆی حەشار ئەدا، هەمووی لە نوسراوی دیاریدایە. ﴿وَتَصْرِيفِ ٱلرِّيَٰحِ﴾ لە جموجۆڵی باکاندا. واتە: جاری وا هەیە بە ڕەحمەت دێت‌و جاری واش هەیە سزای پێوەیە، جاری وایش هەیە هەورێ دێنێ مژدەدەرە، دەیبات‌و کۆیدەکاتەوەو بڵاوەی پێ دەکن‌و نایهێڵێ. جاری وایش هەیە لە باکورەوە دێت کە بای شامی پێدەڵێن‌و لە یەمەنیشەوە، جاری واش هەیە(صبایە) کە بای ڕۆژهەڵاتە، لە ڕوی کەعبەئەدات بای( دەبویش) هەیە کە بای خۆرئاوایە لە ناوچەی پشتی کەعبەوە دێت. خەڵکی زۆر کتێبیان نوسیوە دەربارەی هەواو باران‌و کەش‌و هەوا وئەوەی پەیوەندی پێیانەوە هەیە. باس کردنی لێرەدا زۆر دەبات ﴿وَٱلسَّحَابِ ٱلْمُسَخَّرِ بَيْنَ ٱلسَّمَآءِ وَٱلْأَرْضِ﴾ ئەو هەورانش لە ناوەند زەمین‌و ئاسماندا ڕاگیراون. ئەو هەورانە لە نێوان ئاسمان‌و زەمیندا دەڕۆن‌و خوا ڕامی هێناون بۆ ئەو زەویانە کە خۆی ویستی لەسەریەتی و بارانی لێدە دەبارێنێ ﴿لَءَايَٰتٍ لِّقَوْمٍ يَعْقِلُونَ﴾ بەڵگەی زۆر هەیە بۆ ئەوانەی کە تێدەگەن، لەسەر تاك‌و تەنیایی

---

[1] یس(٣٣-٣٦).

[2] هود(٦).

خودای مەزن. وەك لە ئایەتی ترا ئەفەرموێت: ﴿إِنَّ فِي خَلْقِ السَّمَاوَاتِ وَالْأَرْضِ وَاخْتِلَافِ اللَّيْلِ وَالنَّهَارِ لَآيَاتٍ لِأُولِي الْأَلْبَابِ (١٩٠) الَّذِينَ يَذْكُرُونَ اللَّهَ قِيَامًا وَقُعُودًا وَعَلَىٰ جُنُوبِهِمْ وَيَتَفَكَّرُونَ فِي خَلْقِ السَّمَاوَاتِ وَالْأَرْضِ رَبَّنَا مَا خَلَقْتَ هَٰذَا بَاطِلًا سُبْحَانَكَ فَقِنَا عَذَابَ النَّارِ﴾[1] لە وەدیهێنانی ئاسمانەکانو لە زەمینداو ئاڵوگۆڕی شەوو ڕۆژدا، زۆرنیشانەی بتەوهەیە بۆ ئەوانەی کە خاوەندڵی وشیارن. ئەوانەی چ بەڕاوەستاویی چ لە جێوە بە دانیشتن، چ لەسەر تەنیشت دەخەون هەر یادی خودا دەکەن، لە دروستکردنی ئەم ئاسمانو زەمینە ڕادەمێنن، دەڵێن: ئەی پەروەردگارمان تۆ ئەم دەزگایەت بە فیڕۆ ساز نەداوە، پاکیو بێ عەیبی بۆ تۆیە، هەر خۆشت لە ئازاری بە ئاگر بمانپارێزە.

﴿وَمِنَ النَّاسِ مَن يَتَّخِذُ مِن دُونِ اللَّهِ أَندَادًا يُحِبُّونَهُمْ كَحُبِّ اللَّهِ ۖ وَالَّذِينَ آمَنُوا أَشَدُّ حُبًّا لِّلَّهِ ۗ وَلَوْ يَرَى الَّذِينَ ظَلَمُوا إِذْ يَرَوْنَ الْعَذَابَ أَنَّ الْقُوَّةَ لِلَّهِ جَمِيعًا وَأَنَّ اللَّهَ شَدِيدُ الْعَذَابِ (١٦٥) إِذْ تَبَرَّأَ الَّذِينَ اتُّبِعُوا مِنَ الَّذِينَ اتَّبَعُوا وَرَأَوُا الْعَذَابَ وَتَقَطَّعَتْ بِهِمُ الْأَسْبَابُ (١٦٦) وَقَالَ الَّذِينَ اتَّبَعُوا لَوْ أَنَّ لَنَا كَرَّةً فَنَتَبَرَّأَ مِنْهُمْ كَمَا تَبَرَّءُوا مِنَّا ۗ كَذَٰلِكَ يُرِيهِمُ اللَّهُ أَعْمَالَهُمْ حَسَرَاتٍ عَلَيْهِمْ ۖ وَمَا هُم بِخَارِجِينَ مِنَ النَّارِ (١٦٧)﴾

## ژیانی بت پەرستان لە دنیاو لە ڕۆژی دوایداو حاشاکردنی ڕابەرەکان لە شوێن کەوتوانیان لە ڕۆژی قیامەتادا

﴿وَمِنَ النَّاسِ مَن يَتَّخِذُ مِن دُونِ اللَّهِ أَندَادًا يُحِبُّونَهُمْ كَحُبِّ اللَّهِ﴾ لەم خەڵکەیش هی وا هەیە هاوبەشی بۆ خودا دادەنێن بە ئەندازەی خودا خۆشیان دەوێن. خودای گەورە باسی ژیانی بت پەرستان دەکات چۆن ڕەفتار دەکەن بەرانبەر بە خودا لە دنیاداو چارەنووسیان لە ڕۆژی قیامەتدا. چونکە ئەمانە لە دنیادا هاوبەشیان بۆ خودا دادەناو لەگەڵی دەیانپەرستو وەك خودا خۆشیان دەویستن، ئەو خودایە کە هیچ پەرستراوێك نیە جگە لەو، هاوبەشو هاوتای نیەو بێ شەریکە. لە هەردوو سەحیحەکەدا هاتووە لە عەبدوڵڵای کوڕی مەسعودەوە، دەڵێت: وتم: ئەی پێغەمبەری خودا(ﷺ) چ تاوانێ زۆر گەورەیە؟ فەرمووی: (هاوتا دانێیت بۆ خودا کە ئەو دروستی کردووی)[2]،

﴿وَالَّذِينَ آمَنُوا أَشَدُّ حُبًّا لِّلَّهِ﴾ ئەوانەی خاوەن بڕواشن خودایان لە هەموو شتێ خۆشتر دەوێ. واتە: زۆر خوایان خۆش دەوێ، چونکە خودا بەتەواوی دەناسنو دەزانن تاكو تەنیایەو لە هیچ شتێکا شەریکی بۆ دانانێن، بەڵکو هەرئەو دەپەرستن بە تەنیاو پشت هەر بە ئەو دەبەستنو لە هەموو

---

[1] آل عمران(١٩٠-١٩١).

[2] فتح الباري(٨/٣)، مسلم(١/٩٠).

کاروبارێکیاندا پەنا هەر بۆ ئەو دەبەن. پاشان خودای مەزن هەڕەشە لەو بت پەرستانە دەکات کە ناهەقییان لە خۆیان کردووەو ئەفەرموێت: ﴿وَلَوْ يَرَى الَّذِينَ ظَلَمُوا إِذْ يَرَوْنَ الْعَذَابَ أَنَّ الْقُوَّةَ لِلَّهِ جَمِيعًا وَأَنَّ اللَّهَ شَدِيدُ الْعَذَابِ﴾ ئەو کەسانەی خودا بەڕاستی ناناسن، وەختێ چاویان بە جەزرەبە دان دەکەوێ، ئەوسا بۆیان دەردەکەوێ: هێزو توانا هەموو هی خوایەو ئازارێ کە خودا دەیدا توندو تیژترە. واتە: ئەگەر دەیانزانی چی بەسەریان دێت لە ڕۆژی قیامەتدا، چ ئازارو ئەشکەنجەو سوکایەتیەکیان پێ دەکرێت، لەسەر ئەو بت پەرستیو خوانەناسیەیان، وازیان دەهێنا لەو گومراییەی کە لە دنیادا بەسەری دەبەن. پاشان خودای مەزن باسیان دەکات کە چۆن حاشا لە بتەکانیان دەکەنو چۆن پێشەواکانیان حاشا لە شوێن کەوتووەکانیان دەکەن، ئەفەرموێت:﴿إِذْ تَبَرَّأَ الَّذِينَ اتُّبِعُوا مِنَ الَّذِينَ اتَّبَعُوا﴾ لەو کاتەدا ڕێبەرەکان لە پەیڕەوەکانی خۆیان حاشا دەکەن. واتە: ئەو فریشتانەی کە لە دنیادا ئەوان بە خەیاڵی خۆیان دەیانپەرستن حاشایان لێ دەکەن. فریشتەکان دەڵێن: ﴿تَبَرَّأْنَا إِلَيْكَ مَا كَانُوا إِيَّانَا يَعْبُدُونَ﴾[1] وا لە لای خۆت ئێمە حاشایان لێ دەکەین، ئەوانە هەرگیز ئێمەیان نەدەپەرست.هەروەها دەڵێن: ﴿سُبْحَانَكَ أَنتَ وَلِيُّنَا مِن دُونِهِم بَلْ كَانُوا يَعْبُدُونَ الْجِنَّ أَكْثَرُهُم بِهِم مُّؤْمِنُونَ﴾[2] دەڵێن: هەر تۆی پاکو بێ عەیبی، هەر خۆت گەورەی هەموومانی، ئێمە ئەوانە ناناسین، بەڵکو ئەوانە جنۆکەیان دەپەرستو بەشی زۆریان باوەڕیان بەئەوان هێنا بوو. جنۆکەیش حاشایان لێ دەکەنو بێزاری خۆیان دەردەبڕن لەوەی کە پەرستویانن وەك خودای مەزن ئەفەرموێت: ﴿ وَمَنْ أَضَلُّ مِمَّن يَدْعُوا مِن دُونِ اللَّهِ مَن لَّا يَسْتَجِيبُ لَهُ إِلَىٰ يَوْمِ الْقِيَامَةِ وَهُمْ عَن دُعَائِهِمْ غَافِلُونَ ﴿٥﴾ وَإِذَا حُشِرَ النَّاسُ كَانُوا لَهُمْ أَعْدَاءً وَكَانُوا بِعِبَادَتِهِمْ كَافِرِينَ﴾[3] کێ؟ لەو کەسە گومڕا ترە هانا بۆ جگە لە خودا دەبا؟ بۆ کەسێ کە هەتا قیامەت وەڵامی ناداتەوەو هەر ئاگاشیان لە پاڕانەوەیان نیە. کاتێ خەڵکی هەموویان کۆ دەکرێنەوە، ئەوان دەبنە دوژمنیانو حاشا دەکەن لەوانەی پەرستویانن. خودای گەورە ئەفەرموێت: ﴿وَاتَّخَذُوا مِن دُونِ اللَّهِ آلِهَةً لِّيَكُونُوا لَهُمْ عِزًّا ﴿٨١﴾ كَلَّا ۚ سَيَكْفُرُونَ بِعِبَادَتِهِمْ وَيَكُونُونَ عَلَيْهِمْ ضِدًّا﴾[4] جگە لە خودا

---

[1] القصص(٦٣).

[2] سبأ(٤١).

[3] الأحقاف(٥-٦).

[4] مريم(٨١-٨٢).

ئەوان پەستراوێکی تریان پەرست تابینەهۆی سەریەرزیان. نەخێر، حاشا لە پەرستنیان دەکەن‌و لە دژیشیان ڕادەوەستن، ئیبراهیمی خەلیل(سەلامی خوای لێ بێ) بە هۆزەکەی‌دەڵێت: ﴿إِنَّمَا ٱتَّخَذۡتُم مِّن دُونِ ٱللَّهِ أَوۡثَٰنٗا مَّوَدَّةَ بَيۡنِكُمۡ فِي ٱلۡحَيَوٰةِ ٱلدُّنۡيَاۖ ثُمَّ يَوۡمَ ٱلۡقِيَٰمَةِ يَكۡفُرُ بَعۡضُكُم بِبَعۡضٖ وَيَلۡعَنُ بَعۡضُكُم بَعۡضٗا وَمَأۡوَىٰكُمُ ٱلنَّارُ وَمَا لَكُم مِّن نَّٰصِرِينَ﴾[1] ئێوە لە بری خودا بتتان دەپەرست، کە لە ژیانی دنیادا ئێوە یەکترتان خۆش دەویست، پاشان لە ڕۆژی قیامەتدا حاشا لە یەکتر دەکەن‌و نەفرین بۆ یەکتر دەنێرن. جێشتان لە ئاگردا دەبێ‌و کەسیش یارمەتیتان نادا.: ﴿وَلَوۡ تَرَىٰٓ إِذِ ٱلظَّٰلِمُونَ مَوۡقُوفُونَ عِندَ رَبِّهِمۡ يَرۡجِعُ بَعۡضُهُمۡ إِلَىٰ بَعۡضٍ ٱلۡقَوۡلَ يَقُولُ ٱلَّذِينَ ٱسۡتُضۡعِفُواْ لِلَّذِينَ ٱسۡتَكۡبَرُواْ لَوۡلَآ أَنتُمۡ لَكُنَّا مُؤۡمِنِينَ ٣١ قَالَ ٱلَّذِينَ ٱسۡتَكۡبَرُواْ لِلَّذِينَ ٱسۡتُضۡعِفُوٓاْ أَنَحۡنُ صَدَدۡنَٰكُمۡ عَنِ ٱلۡهُدَىٰ بَعۡدَ إِذۡ جَآءَكُمۖ بَلۡ كُنتُم مُّجۡرِمِينَ ٣٢ وَقَالَ ٱلَّذِينَ ٱسۡتُضۡعِفُواْ لِلَّذِينَ ٱسۡتَكۡبَرُواْ بَلۡ مَكۡرُ ٱلَّيۡلِ وَٱلنَّهَارِ إِذۡ تَأۡمُرُونَنَآ أَن نَّكۡفُرَ بِٱللَّهِ وَنَجۡعَلَ لَهُۥٓ أَندَادٗاۚ وَأَسَرُّواْ ٱلنَّدَامَةَ لَمَّا رَأَوُاْ ٱلۡعَذَابَ وَجَعَلۡنَا ٱلۡأَغۡلَٰلَ فِيٓ أَعۡنَاقِ ٱلَّذِينَ كَفَرُواْۖ هَلۡ يُجۡزَوۡنَ إِلَّا مَا كَانُواْ يَعۡمَلُونَ﴾[2] ئەگەر تۆ ئەو ناهەق پیشانەت بدیایە کە لە بەرانبەر پەروەردگاری خۆیانەوە ڕاگیراون، هەندێ ئاوڕ لە هەندێکیان ئەدەنەوەو قسە دەکەن. ئەوانەی بێ دەسەڵات بوون، بەدەستەڵاتدارەکانی خۆیان دەڵێن: ئەگەر ئێوەنەبوونایە ئێمە بڕوامان دەهێنا. خاوەن دەستەڵاتەکانیش بە بێ دەستەڵاتەکان دەڵێن: ئایا ئێمە بووین نەمانهێشت ئێوە بە ڕێی ڕاستدا بڕۆن، پاش ئەوەی کە ڕێ نیشاندەرتان هاتە لا؟ ئێوە هەر خۆتان تاوانبار بوون. ئەوسا بێ دەستەڵاتەکانیش لە وەڵامی ئەواندا(کە خاوەن دەستەڵات بوون) دەڵێن: ئێوە بە شەوو بە ڕۆژ هەر گەڕتان تێ دەئاڵاندین کە دەبێ خوانەناسن‌و چەندین هاوتای بۆ پەیدا بکەین. کاتێ بینییان بۆ سزادان ئێمە خوانەناسان زنجیر لە مل ڕادەکێشین بۆ لێپرسینەوە بە دڵ پەشیمان دەبنەوە. دیارە هەر کەسەو بەرانبەر بە کردەوەی خۆی سزا ئەدرێت.هەر وە هانەفەرموێت: ﴿وَقَالَ ٱلشَّيۡطَٰنُ لَمَّا قُضِيَ ٱلۡأَمۡرُ إِنَّ ٱللَّهَ وَعَدَكُمۡ وَعۡدَ ٱلۡحَقِّ وَوَعَدتُّكُمۡ فَأَخۡلَفۡتُكُمۡۖ وَمَا كَانَ لِيَ عَلَيۡكُم مِّن سُلۡطَٰنٍ إِلَّآ أَن دَعَوۡتُكُمۡ فَٱسۡتَجَبۡتُمۡ لِيۖ فَلَا تَلُومُونِي وَلُومُوٓاْ أَنفُسَكُمۖ مَّآ أَنَا۠ بِمُصۡرِخِكُمۡ وَمَآ أَنتُم بِمُصۡرِخِيَّۖ إِنِّي كَفَرۡتُ بِمَآ

[1] العنكبوت(٢٥).
[2] سبأ(٣١-٣٣).

أَشۡرَكۡتُمُونِ مِن قَبۡلُۗ إِنَّ ٱلظَّٰلِمِينَ لَهُمۡ عَذَابٌ أَلِيمٞ ﴾[1] له پاش كار له كارترازان، شەیتان دەڵێ: خودا بەڵێنی ڕاستی پێدان. منیش بەڵێنی خۆم پێدان، بەڵام درۆم لەگەڵ كردن، هیچ زۆرێكیشم بە سەرتانەوە نەبووە جگە لەوەی بانگم كردن، ئێوە بە دەنگمەوە هاتن، ئێوە سەركۆنەی من مەكەن، سەرزەنشتی خۆتان بكەن، ناشتوانم بە فریاتان كەوم، هەروەك ئێوە ناتوانن بە فریام كەون، لەمەیش كە لە پێشا منتان بە شەریكی خوا دەزانی، حاشا دەكەم، بێگومان ئەوانەی ناهەقیكارن، ئازاری بە ژانیان دەبێ. لێرەشدا خودای مەزن ئەفەرموێت: ﴿وَرَأَوُاْ ٱلۡعَذَابَ وَتَقَطَّعَتۡ بِهِمُ ٱلۡأَسۡبَابُ﴾ لەو كاتەدا كە ئازارو جەزرەبەیان دێتە بەرچاوو پەیوەندیان. لێكپچڕاوە واتە: كاتێ سزایان بە چاوی خۆیان بینیو گشت هۆیەكی ڕزگاربونیان نەماو پچڕا بەرەو ئاگر بران. عەتا دەڵێت لە ئیبنوعەباسەوە: ﴿وَتَقَطَّعَتۡ بِهِمُ ٱلۡأَسۡبَابُ﴾ پەیوەندیەكان لێكپچڕان.واتە: خۆشەویستی، لە ڕیوایەتێكی ئیبنونەجیح دا موجاهیدیش هەر وای وتوە.[2] ﴿وَقَالَ ٱلَّذِينَ ٱتَّبَعُواْ لَوۡ أَنَّ لَنَا كَرَّةٗ فَنَتَبَرَّأَ مِنۡهُمۡ كَمَا تَبَرَّءُواْ مِنَّاۗ﴾ شوێن كەوتووەكان ئەوسا، دەڵێن: ئای خۆزگە هەر جارێكی تر دەگەڕاینەوە بۆ سەر دنیا، هەتا وەك ڕێبەرەكانمان حاشامان لێ دەكەن، ئێمەش حاشامان لێ دەكردن. واتە: خۆزگە جارێكی تر بگەڕاینایەنەوە بۆ دنیا هەتا ئێمەش دووره پەرێزیمان بكردایە لەوانەو لە پەرستنیانو هەر لاشمان لێ نەكردنایەتەوەو تەنیا هەر خواپەرستیمان بكردایە. ئەمانە لەو قسەدا كە دەیكەن درۆ دەكەن، وەك خودای مەزن دەربارەیان ئەفەرموێت: ﴿كَذَٰلِكَ يُرِيهِمُ ٱللَّهُ أَعۡمَٰلَهُمۡ حَسَرَٰتٍ عَلَيۡهِمۡۖ﴾ خودا ئاوا كردەی خۆیان دەكاتە داخو كەسەر بۆیان. هیچ سوودیان پێ ناگەیەنێ. وەك خودای گەورە ئەفەرموێت: ﴿وَقَدِمۡنَآ إِلَىٰ مَا عَمِلُواْ مِنۡ عَمَلٖ فَجَعَلۡنَٰهُ هَبَآءٗ مَّنثُورًا﴾[3] هەر كارێك كردوویانە ڕای یدەنێنو وەك تۆزی بابردەی لێ دەكەن.هەر وە هاتەفەرموێت: ﴿مَّثَلُ ٱلَّذِينَ كَفَرُواْ بِرَبِّهِمۡۖ أَعۡمَٰلُهُمۡ كَرَمَادٍ ٱشۡتَدَّتۡ بِهِ ٱلرِّيحُ فِي يَوۡمٍ عَاصِفٖۖ﴾[4] ئەو كەسانەی لە پەروەردگاری خۆیان حاشا دەكەن، كردەوەكانیان وەك خۆڵەمێشێك وایە بە توندی با لێی هەڵكردبێ. ئە ش فەرموێت: ﴿وَٱلَّذِينَ كَفَرُوٓاْ أَعۡمَٰلُهُمۡ كَسَرَابِۭ بِقِيعَةٖ

---

[1] ابراهیم(٢٢).

[2] الطبري(٣/٢٩٠).

[3] الفرقان(٢٣).

[4] ابراهیم(١٨).

﴿يَحۡسَبُهُ ٱلظَّمۡـَٔانُ مَآءً﴾[1] ئەوانەی کە خوانەناس بوون، کردەوەیان وەك تراویلکە وایە کەلە بیاباندا هەیە، تینوو وادەزانیٚ ئاوە. هەر بۆیە خودای گەورە لێرەدا ئەفەرموێت: ﴿وَمَا هُم بِخَٰرِجِينَ مِنَ ٱلنَّارِ﴾ بۆ هەمیشە لەناو ئاگردا دەبن. هەرگیز لێی نایەنە دەرەوە.

﴿يَٰٓأَيُّهَا ٱلنَّاسُ كُلُواْ مِمَّا فِي ٱلۡأَرۡضِ حَلَٰلٗا طَيِّبٗا وَلَا تَتَّبِعُواْ خُطُوَٰتِ ٱلشَّيۡطَٰنِۚ إِنَّهُۥ لَكُمۡ عَدُوّٞ مُّبِينٌ ١٦٨ إِنَّمَا يَأۡمُرُكُم بِٱلسُّوٓءِ وَٱلۡفَحۡشَآءِ وَأَن تَقُولُواْ عَلَى ٱللَّهِ مَا لَا تَعۡلَمُونَ ١٦٩﴾

**فەرماندان بە خواردنی حەلاڵ و ڕێگری لە شوێن کەوتنی شەیتان**

﴿يَٰٓأَيُّهَا ٱلنَّاسُ كُلُواْ مِمَّا فِي ٱلۡأَرۡضِ حَلَٰلٗا طَيِّبٗا وَلَا تَتَّبِعُواْ خُطُوَٰتِ ٱلشَّيۡطَٰنِۚ إِنَّهُۥ لَكُمۡ عَدُوّٞ مُّبِينٌ﴾ ئەی خەڵکینە، لەو بەروبوومەی سەر زەمینە، کامی ڕەواو پاکە بخۆن. بە شوێن شەیتانا مەڕۆن، کە ئەو بۆتان دوژمنێکی ئاشکرایە. کاتیٚ خودای مەزن باسی ئەوەی کرد کە هیچ پەرستراویٚ نیە جگە لەئەو بیٚ نیازیشە لە هەموو شت، باسی ئەوەمان بۆ دەکات کە هەر خۆشی ڕۆزی ئەدا بە گشت دروستکراوەکانیو منەت بەسەر عەبدەکانیدا کە هەرچی لە زەمینایە حەلاڵو زەلالە بۆیان جگە لەو شتانەی قەدەغەی کردوە لێیان. کە هیچ زیانی نیە بۆ تەندروستیو ئاوەزیان، بەلاّم ڕێگری لیٚ کردوون کە شوێن شەیتان بکەون لەو شتانەدا کە شوێنکەوتووەکانی، گومرا کردوە پێی لە قەدەغە کردنی(بە جائیرو سوائبو وصائل) جۆری ئەمانە. ئەوانەی کە لە چەرخی نەفامیدابۆی ڕازاندبوونەوە. وەك ئەو فەرموودەیەی عەیازی کوڕی جمار کە لە سەحیحی موسلیما هاتوە لە پێغەمبەری خوداوە(ﷺ) کە فەرموویەتی: (خودای مەزن بێگومان هەر ماڵیٚ بەخشیومە بە عەبدەکانی خۆم، ئەوە بۆیان حەلاڵە من بەندەکانم بە پاکیو یەکتاپەرستی دروست کردوە،شەیتانەکان هاتوون بۆیان لە ئاینەکەیان لایداون، ئەوەی بۆم حەلاڵ کردن، لێی حەرام کردن)[2]، چونکە: ﴿إِنَّهُۥ لَكُمۡ عَدُوّٞ مُّبِينٌ﴾ ئەو دوژمنێکی ئاشکرایە بۆتان. خودای گەورە خاوەن باوەڕان دەترسێنیو ئاگاداریان دەکاتەوە وەك لە ئایەتێکی تردا ئەفەرموێت: ﴿إِنَّ ٱلشَّيۡطَٰنَ لَكُمۡ عَدُوّٞ فَٱتَّخِذُوهُ عَدُوًّاۚ إِنَّمَا يَدۡعُواْ حِزۡبَهُۥ لِيَكُونُواْ مِنۡ أَصۡحَٰبِ ٱلسَّعِيرِ﴾[3] شەیتان دوژمنی ئێوەیە، سائێوەش ببنە دوژمنی، ئەو هەر بۆیە دارو دەستەی بانگ دەکات تا لە یارانی ئاگر بن.یان وەفەرموێت: ﴿أَفَتَتَّخِذُونَهُۥ وَذُرِّيَّتَهُۥٓ أَوۡلِيَآءَ مِن دُونِي وَهُمۡ لَكُمۡ عَدُوُّۢۚ بِئۡسَ لِلظَّٰلِمِينَ بَدَلٗا﴾[4] ئایا

---

[1] النور(٣٩).

[2] مسلم(٢١٩٧/٤).

[3] فاطر(٦).

[4] الكهف(٥٠).

توخمی شەیتان جگە لە من دەکەن بە دۆستی خۆتان کە بە ئاشکرا دوژمنتانن؟ ئای چ گۆڕینەوەیەکی خراپە گوێڕایەڵی ستەمکارانن. قەتادەو سوودی لەم دەقەدا کە خودای مەزن ئەفەرموێت: ﴿وَلَا تَتَّبِعُواْ خُطُوَٰتِ ٱلشَّيۡطَٰنِ﴾ دوای هەنگاوەکانی شەیتان مەکەون، وتیان: هەموو سەرپێچیو بێ فەرمانیەکی خودا لە هەنگاوەکانی شەیتانە[1] عەبدی کوڕی حومەید ڕیوایەتی کردوە لە ئیبنوعەبباسەوە، دەڵێت: هیچ سوێندێ یا نەزرێ نیە مەگەر لە کاتی تووڕەیدا، ئەوە لە هەنگاوەکانی شەیتانە. کەفارەتەکەی کەفارەتی سوێندە. پاشان خودای مەزن ئەفەرموێت: ﴿إِنَّمَا يَأۡمُرُكُم بِٱلسُّوٓءِ وَٱلۡفَحۡشَآءِ وَأَن تَقُولُواْ عَلَى ٱللَّهِ مَا لَا تَعۡلَمُونَ﴾ هەر ئەو فەرمانتان پێ ئەدات: کاری پیسو زۆر نالەبار ڕەچاو کەنو شتانی وا دەربارەی خودا بڵێن کە هەر ئاگاشتان لێ نیە. واتە: دوژمنەکەتان شەیتان فەرمانتان پێ دەکات کە کاری پیسو خراپ، لە خراپترینیان داوێنپیسی وشتی تریش.ئەنجام بدەن خراپتر لەوەیش قسە کردن دەربارەی خودا بەبێ زانیاری. کە خوانەناسیو داهێنانی شتی وایە کە لە ئایندا نیە.

﴿وَإِذَا قِيلَ لَهُمُ ٱتَّبِعُواْ مَآ أَنزَلَ ٱللَّهُ قَالُواْ بَلۡ نَتَّبِعُ مَآ أَلۡفَيۡنَا عَلَيۡهِ ءَابَآءَنَآۚ أَوَلَوۡ كَانَ ءَابَآؤُهُمۡ لَا يَعۡقِلُونَ شَيۡـًٔا وَلَا يَهۡتَدُونَ ﴿١٧٠﴾ وَمَثَلُ ٱلَّذِينَ كَفَرُواْ كَمَثَلِ ٱلَّذِي يَنۡعِقُ بِمَا لَا يَسۡمَعُ إِلَّا دُعَآءً وَنِدَآءًۚ صُمُّۢ بُكۡمٌ عُمۡيٌ فَهُمۡ لَا يَعۡقِلُونَ ﴿١٧١﴾﴾

### بت پەرست چاولێکەرە

﴿وَإِذَا قِيلَ لَهُمُ ٱتَّبِعُواْ مَآ أَنزَلَ ٱللَّهُ قَالُواْ بَلۡ نَتَّبِعُ مَآ أَلۡفَيۡنَا عَلَيۡهِ ءَابَآءَنَآ﴾ ئەگەر بەوانە بڵێن: هەر بە شوێن ئەودا بڕۆن کە لە خوداوە ڕەوانە کراوە، دەڵێن: نەخێر ئێمە هەر ئەو کارە دەکەین کە بابو باپیرانمان ڕەچاویان کردوە. خودای گەورە ئەفەرموێت ئەگەر بەو خوانەناسو بت پەرستانە بوترێ شوێن ئەو پەیامە بکەون کە خودا ناردوویەتی بۆ پێغەمبەرەکەی(ﷺ) واز بێنن لەو گومراییو نەفامیە کە لەسەرین. لە وەڵامدا دەڵێن: ئێمە شوێن ئەو ڕێو ڕچەی بابو باپیرانمان دەکەوین. واتە: لە پەرستنی ئەو بتو هەیکەلانەدا، خودای مەزنیش وەڵامیان ئەداتەوەو ئەفەرموێت: ﴿أَوَلَوۡ كَانَ ءَابَآؤُهُمۡ لَا يَعۡقِلُونَ شَيۡـًٔا وَلَا يَهۡتَدُونَ﴾ جا بابو باپیرانی ئەوان هیچیان لە هیچ نەدەزانیو ڕاستە ڕێشیان هەر نەدیوە. واتە: نە ئاوەزیان هەبوەو نە ڕاستە ڕێشیان گرتوە. ئیبنوئیسحاق لە ئیبنوعەبباسەوە ڕیوایەتی کردوە کە لەسەر کۆمەڵێ لە جوولەکە هاتۆتە خوارەوەکە پێغەمبەری خودا(ﷺ) بانگی

---

[1] ابن ابي حاتم غ: (١/٢٢١).

کردن بۆ موسڵمان بوون، وتیان: نەخێر، ئێمە هەر ئەو کارە دەکەین کە باب‌و باپیرانمان کردوویانەو لەسەری بوون، خودای گەورە ئەم ئایەتەی ناردە خوارەوە[1].

**بتپەرست وەك ئاژەڵ وایە**

پاشان خودای گەورە نموونە دەربارەی ئەو بتپەرستانە دەهێنێتەوەو ﴿ لِلَّذِينَ لَا يُؤْمِنُونَ بِالْآخِرَةِ مَثَلُ السَّوْءِ ﴾[2] ئەم کردەوە خراپانەی ئەوانەیەکە باوەڕیان بە ڕۆژی قیامەت نیە. هەروەها ئەفەرموێت: ﴿ وَمَثَلُ الَّذِينَ كَفَرُوا كَمَثَلِ الَّذِي يَنْعِقُ بِمَا لَا يَسْمَعُ إِلَّا دُعَاءً وَنِدَاءً ﴾ نمونەی ئەو خوانەناسانە وەك نموونەی ئاژەڵەئەو ئاژەڵانە وایە زە دەنگ ئەدرێ جیا لە خوڕین‌و چڕین هیچ نابیسن. واتە: لە گومرایی‌و نەفامیەکی وادان وەك ئاژەڵێ وان کە لە هیچ تێ ناگەن. تەنیا ئەوە نەبێ کە شوانەکە تێیان ئەخوڕێ بۆ ئەوەی بەم لاو ئەولادا ئەچن بەڵام ئەوان هەر دەنگەکەی دەبیسن. هەر بەمجۆرە لە ئیبنوعەبباس‌و ئەبولعالیەوەڕیوایەت کراوە[3] موجاهیدو عیکرمەش هەر وایان وتوە[4] عەتاو حەسەن‌و قەتادەو عەتای خۆراسانیش هەر وایان وتوە[5] ڕەبیعی کوڕی ئەنەسیش هەر وای وتوە[6] پاشان ئەفەرموێت: ﴿صُمٌّ بُكْمٌ عُمْيٌ﴾ کەڕن، لاڵن، چاویان کوێرە. واتە: لە بیستنی هەق کەڕن‌و لاڵن هیچ شتێ فێر نابن، کوێرن ڕێگەی ڕاست نابینن تا لەسەری بڕۆن ﴿فَهُمْ لَا يَعْقِلُونَ﴾ هیچ ئاوەزیشیان نیەو لە هیچیش تێ ناگەن.

﴿ يَا أَيُّهَا الَّذِينَ آمَنُوا كُلُوا مِنْ طَيِّبَاتِ مَا رَزَقْنَاكُمْ وَاشْكُرُوا لِلَّهِ إِنْ كُنْتُمْ إِيَّاهُ تَعْبُدُونَ ﴿١٧٢﴾ إِنَّمَا حَرَّمَ عَلَيْكُمُ الْمَيْتَةَ وَالدَّمَ وَلَحْمَ الْخِنْزِيرِ وَمَا أُهِلَّ بِهِ لِغَيْرِ اللَّهِ فَمَنِ اضْطُرَّ غَيْرَ بَاغٍ وَلَا عَادٍ فَلَا إِثْمَ عَلَيْهِ إِنَّ اللَّهَ غَفُورٌ رَحِيمٌ ﴿١٧٣﴾ ﴾

---

[1] الطبري(٢/٣٠٥).
[2] النحل(٦٠).
[3] ابن ابي حاتم غ: (١/٢٢٥).
[4] ابن ابي حاتم غ: (١/٢٢٦).
[5] ابن ابي حاتم غ: (١/٢٢٧).
[6] ابن ابي حاتم غ: (١/٢٢٨).

## فەرماندان بە خواردنی شتە پاکەکان و ڕوون کردنەوەی قەدەغە کراوەکان

﴿يَٰٓأَيُّهَا ٱلَّذِينَ ءَامَنُواْ كُلُواْ مِن طَيِّبَٰتِ مَا رَزَقْنَٰكُمْ وَٱشْكُرُواْ لِلَّهِ إِن كُنتُمْ إِيَّاهُ تَعْبُدُونَ ﴿١٧٢﴾ إِنَّمَا حَرَّمَ عَلَيْكُمُ ٱلْمَيْتَةَ وَٱلدَّمَ وَلَحْمَ ٱلْخِنزِيرِ وَمَآ أُهِلَّ بِهِۦ لِغَيْرِ ٱللَّهِ﴾ ئەی کۆمەڵی خاوەن باوەڕان لەوڕۆزییە کە پێمان داوون، کامەی پاکە ئەوە بخۆن، شوکری خودایش بە جێ بێنن، ئەگەر هەر ئەو دەپەرستن. تەنیا هەر لاکی مردارۆ بوو گۆشتی بەرازو خوێنو ئەوەی بۆ سەربڕین ناوی بێجگە لە خودای لێ دێنن لەسەرتان حەرام مان کردوە. خودای مەزن فەرمان دەکات بە عەبدە خاوەن باوەڕەکانی بە خواردنی ئەو شتە پاکانەی کە خودا بۆی حەلاڵ کردونو سوپاسو ستایشی خودای لەسەر بکەن ئەگەر ڕاست دەکەن عەبدی ئەون، چونکە خواردنی حەلاڵ هۆی وەرگرتنی خواناسیە وەك چۆن خواردنی حەرام دەبێتە هۆی وەرنەگرتنی دوعاوپەرستشەکان وەك لەم فەرموودەیدا کە ئیمامی ئەحمەد ڕیوایەتی کردوە لە ئەبوهورەیرەوە دەڵێت: پێغەمبەری خودا(ﷺ) فەرموویەتی: (ئەی خەڵکینە! خودا پاکەو پاك نەبێ وەری ناگرێ. بێگومان خودا فەرمانیداوە بە خاوەن باوەڕان بەوەی کە داویەتی بە پێغەمبەرانیش(سەلامی خوایان لێ بێ) ئەفەرموێت: ﴿يَٰٓأَيُّهَا ٱلرُّسُلُ كُلُواْ مِنَ ٱلطَّيِّبَٰتِ وَٱعْمَلُواْ صَٰلِحًا إِنِّي بِمَا تَعْمَلُونَ عَلِيمٌ﴾[1] ئەی کۆمەڵچێ پێغەمبەران، بژێوی پاك بخۆنو ئاکار چاك بن، لە هەر کارێ ئێوە دەیکەن ئاگادارم. یان ئەفەرموێت: ﴿يَٰٓأَيُّهَا ٱلَّذِينَ ءَامَنُواْ كُلُواْ مِن طَيِّبَٰتِ مَا رَزَقْنَٰكُمْ﴾ ئەی کۆمەڵی خاوەن باوەڕ، لەو بژێویەی پێمان داوون کامی پاکە ئەوە بخۆن. پاشان باسی ئەو پیاوەی کردوە کە لە سەفەرێکی درێژ دایە، قژ گژو پێ تۆزاوی دەستەکانی بەرەو ئاسمان بەرزدەکاتەوە و دەڵێ: ئەی پەروەردگارم، ئەی پەروەردگارم. خواردنی حەرامە، خواردنەوەی حەرامە، پۆشاکی حەرامە، بە حەرامی دەرخوارد دراوە، چۆن قبووڵ دەکرێ کەسی وا؟[2] موسلیمو تیرمیزیش ڕیوایەتیان کردووە[3] کاتێ کە خودای گەورە منەت دەکات بەسەریاندا ڕێنماییان دەکات بۆ خواردنی پاكو حەلاڵ ئەفەرموێت:کە هیچی لێ حەرام نەکردون جگە لە چەند شتێك نەبێ وەك مردارەوە بوو،کەئەوەیە خۆی مردار دەبێتەوەو سەر نابڕێ. ئاژەڵی خنکاو ئەوەی لێی ئەدرێ تا گیانی دەردەچێو ئەوەی لە بەرزی کەوتبێتە خوارەوەو مردبێو شۆخ لێدراو(بەو شۆقە مردبێ) یان گیانەوەری دڕندە لێیدا بێو کوشتبێتی. بەلام مردارۆبووی لێجیا کراوەتەوە، وەك خوای گەورە ئەفەرموێت: ﴿أُحِلَّ لَكُمْ صَيْدُ ٱلْبَحْرِ

---

[1] المؤمنون(٥١).

[2] أحمد(٣/٣٢٨)، فەرموودەیەکی سەحیحە.

[3] مسلم(٢/٧٠٣)، تحفة الاحوذي(٨/٣٣٣).

وَطَعَامُهُ﴾[1] ڕاوو خواردەمەنی دەریا بۆ ئێوە ڕەوا كراوە. بەو زوانە لە فەرموودەكەی(العنبر)[2]دا باس دێت[3] بە ویستی خوا. لە موسنەدەكانی(موطأ) ئیمامی مالیكو سونەنەكاندا پێغەمبەر(ﷺ) فەرموویەتی: دەربارەی دەریا(ئاوەكەی پاكو پاك كەرەوەیەو مردارۆبووشی حەلاڵە).[4] ئیمامی شافیعیو ئەحمەدو ئیبنوماجەو دارولقەتنی فەرموودەكەی ئیبنوعومەریان بە مەرفوعی ڕیوایەت كردوە: دوو مردارۆ بوو، دوو خوێنمان بۆ حەلاڵ كراوە: ماسیو كوللەو جگەرو سپڵ[5]، ئەم باسە بەو زوانە لە سورەتی مائیدەدا دێت بە ویستی خودای مەزن.

**مەسەلەیەك**

شیرو هێلكەكە مردارۆ بوو بە مردارۆ بووەكەوە بێ پیسە لە لای شافیعیو كەسانی تریش، چونكە بەشێكە لە مردارۆ بووەكە. لە ڕیوایەتێكی مالیكا هاتووە خۆی پاكە، بەڵام لەگەڵ مردارۆبووەكە پیسە. شیری مردارۆ بوو كە خۆی بێتە دەرەوە هەر پیسەو ناكۆكی لەسەر نیە، خواردنی پەنیری مەجوسیان كردۆتە بەڵگە بۆ خۆیان، قورتوبی لە تەفسیرەكەیدا لێرەدا دەڵێ: كەمێ شیر تێكەڵ ببێ، چاوپۆشی كراوە لە كەمێ پیسی كاتێ كە تێكەڵی شلەیەكی زۆر بوو[6] ئیبنوماجە لە سولەیمانەوەڕیوایەتی كردوە(ڕەزای خوای لێ بێ) كە پرسیار كراوە لە پێغەمبەری خودا(ﷺ) لە چەوریو پەنیرو فەرانذا(الفراء) فەرمووی: (حەلاڵ ئەوەیە كە خودا حەلاڵی كردوە لە كتێبەكەیدا، حەرام یش ئەوەیە كە خودا حەرامی كردوە لە كتێبەكەیدا، ئەوەیشی لێی یشی بێدەنگ بووە ئەوە لەو شتانەیە كە خودا چاوپۆشی لێ كردوە)[7]، هەر بەو جۆرە خودا گۆشتی بەرازی حەرام كردوە، سەر بڕابێ، یان تۆپی بێ هەر حەرامە. چەوریەكەیشی وەك گۆشتەكەی وایە، كە وتت گۆشت چەوریەكەیشی دەگرێتەوە یان بە ڕێگەی قیاسی لەسەر ڕای تر. وە هەر شتێ ناوی جگە لە خودای لەسەر بڕابێ یان لەسەر غەیری ناوی خودا سەر بڕابێ لە بتو هەیكەڵو كێل پەرستیو گرەو لەسەر تیر ئەندازیو شێوەی ئەمانە كە لە

---

[1] المائدة(٩٦).

[2] عەنبەر گیاندارێكی زۆر گەورە بوو لە دەریادا، ئەبوموسای ئەشعەریو هاوەڵەكانی دۆزیانەوە، لە كەناری دەریادا، مانگێ لێیان خوارد.

[3] إبن ماجه(٢/٧٧)، تحفة الاحوذي(٤/٥١٠).

[4] أحمد(٥/٣٦٥)، الموطأ(١/٢٢)، أبوداود(١/٦٤)، تحفة الاحوذي(١/٢٢٤)، النسائي(١/٥٠)، إبن ماجة(١/١٣٦)، فەرموودەیەكی بەهێزە.

[5] ترتيب مسند الشافعي(٢/١٧٣)، أحمد(٢/٩٧)، إبن ماجة(٢/١٠٧٣)، الدر القطني(٤/٢٧٢)، فەرموودەیەكی مەوقوفە.

[6] القرطبي(٢/٢٢١).

[7] إبن ماجة(٢/١١١٧)، فەرموودەیەكی لاوازە.

چەرخی نەفامیدا بۆیان سەر براوە هەمووی حەرامە. قورتوبی لە عائیشەوە(ڕەزای خوای لێ بێ) هێناویەتی: کە پرسیاری لێ کراوە لەوانەی عەجەم سەری دەبڕن بۆ جەژنەکانیان و دەیکەنە دیاری بۆ موسوڵمانان،وتویەتی: ئەوەی بۆئەو ڕۆژە سەربڕاوە لێی مەخۆن. لەبەری درەختەکانیان بخۆن[1].

## حەلاڵ بوونی حەرام بۆکەسانی ناچاربوو

خودای مەزن ڕێگەی خواردنی شتی قەدەغە کراوی داوە لە کاتی ناچاریدا، ئەگەر خواردنی حەڵاڵی دەست نەکەوت ﴿فَمَنِ اضْطُرَّ غَيْرَ بَاغٍ وَلَا عَادٍ﴾ ئەگەر کەسێ بە ناچاری یەکێ لەمانەی خوارد بە بێ یاخی بوون و دەرچوون لە سنوور، ﴿فَلَا إِثْمَ عَلَيْهِ﴾ هیچ گوناهی ناگا. لەوانە بخوات ﴿إِنَّ اللَّهَ غَفُورٌ رَّحِيمٌ﴾ خودا لە گوناە خۆش دەبێ و دلۆڤانە. موجاهید دەڵێت: هەرکەسێ ناچار بوو بە بێ یاخی بوون و لە سنوور دەرچوون واتە: چەتەیی وڕێگریی نەدەکرد یان خۆی جیا نەکردبوەوە لە ئوممەت یان لە فەرمانی خودا سەرپێچی نەکردبوو بۆی ڕوایە بیخوات. بەڵام هەر کەسێ سەرپێچی کردبوو لە فەرمانی خوداو یان یاخی بوو یان لە سنوور دەرچوو بوو ئەوە ڕێی پێ نادرێ با ناچاریش بێ. هەر وا ڕیوایەت کراوە لە سەعیدی کوڕی جوبەیرەوە لە ڕیوایەتێکدا لێیەوە، لە موقاتلیشەوە ﴿غَيْرَ بَاغٍ﴾ واتە: بە ڕەوای دانەنێ.[2] لە ئیبنوعەبباسەوە ﴿غَيْرَ بَاغٍ وَلَا عَادٍ﴾ دەڵێت: بێ ئارەزوو لە خواردنی مردارۆ بووەکە. قەتادە دەڵێت: هەرکەسێ بێ ئارەزوو لەو مردارۆ بوە بخوات واتە: لە حەڵاڵەوە نەچێ بۆ حەرام خواردن، ئەوە ڕێی پێدراوە لێی بخوات[3].

## مەسەلەیەك

ئەگەرکەسێکی ناچار مردارۆ بوویەکی دۆزیەوە، خواردنی کەسێکیشی لەبەردەستیدابوو بە مەرجێ بە زۆر لێی نەسێنێ و ئازاری پێی نەگەیەنێ، لەوێدا بۆی ڕوا نیە مردارۆ بوو بخوات. بەڵکو بۆی هەیە لەو خواردنەی غەیرەز خۆی بخوات بە بێ ناکۆکی لە نێوان زانایاندا، ئیبنوماجە ڕیوایەتی کردوە لە عەببادی شورەحبیلی غوبەریەوە دەڵێت: تووشی ساڵێکی قات و قڕی هاتین، هاتم بۆ مەدینە، چوومە لای دیوارێك گوڵەگەنمم پرواندو خواردمو لێشم کردە سەر پۆشاکەکەم، خاوەنی دیوارەکە هات لێی دام و پۆشاکەکەشمی برد. هاتم بۆ خزمەت پێغەمبەری خودا(ﷺ) بۆم باس کرد. فەرمووی بە پیاوەکە برسی بوو خواردنت پێ نەداو کەنەزانیش بوو فێرت نەکرد، فەرمانی پێدا کە پۆشاکەکەی بداتەوە،

---

[1] القرطبي(٢/٢٢٤).

[2] ابن ابي حاتم غ: (١/٢٣٦).

[3] الطبري(٣/٣٢٤).

فەرمانیدا کە ویسقێك یان نیو ویسقی خواردنی پێ بدرێت[1]، ئەم فەرموودە سەنەدەکانی سەحیح و بەهێزو حەسەنە پشتگیری زۆرە، لەوانە فەرموودەکەی عەمری کوڕی شوعەیب لە باوکیەوە لە باپیریەوە دەڵێت: پرسیار کرا لە پێغەمبەری خودا(ﷺ) لە بەروبوومی هەڵواسراو، فەرمووی: (هەرکەسێ لێی برد لەوانەی خاوەن پێویستیە بە دەمی(لێی خوارد) بە کۆش لێی هەڵنەگرت هیچی لەسەر نیە).[2] موقاتلی کوڕی لەم دەقەدا کە خودای مەزن ئەفەرموێت: ﴿﴾ هیچ گوناهێکی ناکا خودا لە گوناهان خۆش دەبێو دلۆڤانە. لەوەی خودا وتویەتی بە ناچاری.[3] سەعیدی کوڕی جوبەیر، دەڵێت: لێبوردەیە لەوەی کە بە حەرامی خوراوە، دلۆڤانە کاتێ کە حەرامی بۆ حەلاڵ دەکات لە ناچارییدا.[4] لە مەسروقەوە، دەڵێت: هەر کەسێ ناچار بوو نەیخواردو نەیخواردەوە، پاشان مرد،چووەتە ناو ئاگر.[5] ئەمە ئەوە دەگەیەنێ کە خواردنی مردارێ بوو بۆ ناچار عەزیمەیە، ڕوخسە نیە.

﴿ إِنَّ ٱلَّذِينَ يَكْتُمُونَ مَآ أَنزَلَ ٱللَّهُ مِنَ ٱلْكِتَٰبِ وَيَشْتَرُونَ بِهِۦ ثَمَنًا قَلِيلًا ۙ أُو۟لَٰٓئِكَ مَا يَأْكُلُونَ فِى بُطُونِهِمْ إِلَّا ٱلنَّارَ وَلَا يُكَلِّمُهُمُ ٱللَّهُ يَوْمَ ٱلْقِيَٰمَةِ وَلَا يُزَكِّيهِمْ وَلَهُمْ عَذَابٌ أَلِيمٌ ﴿١٧٤﴾ أُو۟لَٰٓئِكَ ٱلَّذِينَ ٱشْتَرَوُا۟ ٱلضَّلَٰلَةَ بِٱلْهُدَىٰ وَٱلْعَذَابَ بِٱلْمَغْفِرَةِ ۚ فَمَآ أَصْبَرَهُمْ عَلَى ٱلنَّارِ ﴿١٧٥﴾ ذَٰلِكَ بِأَنَّ ٱللَّهَ نَزَّلَ ٱلْكِتَٰبَ بِٱلْحَقِّ ۗ وَإِنَّ ٱلَّذِينَ ٱخْتَلَفُوا۟ فِى ٱلْكِتَٰبِ لَفِى شِقَاقٍۭ بَعِيدٍ ﴿١٧٦﴾ ﴾

## زەمی جوولەکە دەربارەی شاردنەوەی ئەوەی کە خودا ڕەوانەی کردوە

﴿ إِنَّ ٱلَّذِينَ يَكْتُمُونَ مَآ أَنزَلَ ٱللَّهُ مِنَ ٱلْكِتَٰبِ ﴾ ئەو کەسانەی ناوەڕۆکی کتێبێ کە خوا ناردویەتی دەشارنەوە. مەبەست پێی ئەو جوولەکانەیە سیفەتەکانی موحەممەدیان(ﷺ) لە کتێبەکەیاندا شاردەوە کە لە لای خۆیانەو شایەتی ئەدا کە ڕەوانە کراو پێغەمبەری خودایە، ئەوەیان بۆیە شاردەوە هەتا دەستەلاتیان لە دەست نەچێو ئەوەی لە عەرەبەکانیان وەردەگرت لە دیاریو شتی نایاب بە هۆی ئەو ڕێزەوە لێیان دەنان. ترسان لەوە کە خەڵکی شوێنی بکەوێ واز لەوان بێنن ئەوەیان شاردەوە هەتا ئەو ڕێزەیان هەر بمێنێو ئەو دەست کەوتەیان لە دەست نەچێو خۆیان فرۆشت بەوەو گۆڕیانەوە بەو ڕێگە ڕاستەو شوێن کەوتنی هەقو بڕوا هێنان بە پێغەمبەرو(ﷺ) ئەوەی کە هێناویەتی لە لایەن خوداوە بەو شتە زۆر کەمە.بەمەش ڕەنجەڕۆو زیانبار بوون لە دنیاو لە

---

[1] إبن ماجة(٢/٧٧٠).

[2] تحفة الاحوذي(٤/٥١٠).

[3] ابن ابي حاتم غ: (١/٢٤٠).

[4] ابن ابي حاتم غ: (١/٢٤٠).

[5] البيهقي(٩/٣٥٧).

قیامەتدا. ئەوە لە دنیادا خودای گەورە ڕاستی پێغەمبەرەکەی(ﷺ) دەرخست بۆ عەبدەکانی لە خۆی ناردوویەتی‌و بەڵگەو نیشانەی دیارو ئاشکرای لەگەڵا نارد، ئەوانەی کە ئەوان دەترسان شوێنی بکەون، شوێنی کەوتن‌و بوونە هاوکارو یارمەتیی دەری دژی ئەوان‌و شەڕ کردن لەگەڵیان. تووشی ڕق‌و تووڕەیی خوا هاتن بە بەردەوامی، خودای مەزن لە شوێنی تریشدا باسی خراپی جوولەکەی کردوە لە قورئاندا. لەوانە ئەم ئایەتە کە ئەفەرموێت: ﴿إِنَّ ٱلَّذِينَ يَكۡتُمُونَ مَآ أَنزَلَ ٱللَّهُ مِنَ ٱلۡكِتَٰبِ وَيَشۡتَرُونَ بِهِۦ ثَمَنٗا قَلِيلًاۙ أُوْلَٰٓئِكَ مَا يَأۡكُلُونَ فِي بُطُونِهِمۡ إِلَّا ٱلنَّارَ﴾ ئەو کەسانەی ناوەڕۆکی کتێبێ کە خوا ناردویە، دەشارنەوەو بە نرخێ کەم دەیفرۆشن، ورگیان لە ئاگر پڕ دەکەن. بێگومان ئەوەی کە دەیخۆن، لەبەرئەوە دەیخۆن لە ڕۆژی قیامەتدا، چونکە هەقیان شاردۆتەوە بە قازانجێکی کەمی دنیا. وەك خودای گەورە ئەفەرموێت: ﴿إِنَّ ٱلَّذِينَ يَأۡكُلُونَ أَمۡوَٰلَ ٱلۡيَتَٰمَىٰ ظُلۡمًا إِنَّمَا يَأۡكُلُونَ فِي بُطُونِهِمۡ نَارٗاۖ وَسَيَصۡلَوۡنَ سَعِيرٗا﴾[1] ئەو کەسانەی بە ناڕەوا دارایی هەتیوان دەخۆن. با بزانن ئاگر دەخەنە ناو هەناویانەوەو تووشی ئاگرێکی بە هەڵپەو گڕ دەبن.لە فەرموودەی سەحیحدا هاتووە لە پێغەمبەری خوداوە(ﷺ) فەرموویەتی: (هەرکەسێ لە دەفری زێڕو زیودا دەخوات‌و دەخواتەوە، ئەوە ئاگری دۆزەخ لەناو سکیدا قوڵتە قوڵتی دێت)[2]، پاشان خودای مەزن لێرەدا ئەفەرموێت: ﴿وَلَا يُكَلِّمُهُمُ ٱللَّهُ يَوۡمَ ٱلۡقِيَٰمَةِ وَلَا يُزَكِّيهِمۡ وَلَهُمۡ عَذَابٌ أَلِيمٌ﴾ خودا لە ڕۆژی قیامەتدا نایاندوێنی‌ولە گوناهیان پاك ناکاتەوەو بەشیان ئازاری بە ژانە. چونکە خودای گەورە تووڕەیە لێیان، لەبەرئەوە هەقیان شاردەوە کە زۆر چاکیش دەیانزانی ﴿أُوْلَٰٓئِكَ ٱلَّذِينَ ٱشۡتَرَوُاْ ٱلضَّلَٰلَةَ بِٱلۡهُدَىٰ﴾ ئەو ڕێگەڕاستەیان بە گومڕایی گۆڕیەوە. واتە: ڕێگەی خودایان کە بریتی بوو لە دەرخستنی ئەو سیفەتانەی پێغەمبەرو باسی ڕەوانەکردنی‌و مژدە دان بە هاتنی لە کتێبی پێغەمبەرەکاندا(سەلامی خوایان لێ بێ)و شوێن کەوتنی‌و بڕوا پێکردنیان شاردەوەو گۆڕیانەوە بە گومڕایی‌و بێ بڕوایی‌و حاشا کردن لێی‌و شاردنەوەی سیفەتەکانی لە کتێبەکانی خۆیاندا ﴿وَٱلۡعَذَابَ بِٱلۡمَغۡفِرَةِ﴾ بەخشینی خوایان گۆڕیەوە بە سزا ﴿فَمَآ أَصۡبَرَهُمۡ عَلَى ٱلنَّارِ﴾ دەبێ چەندە لەسەر ئاگر خۆڕاگرن؟ خودای مەزن ئەفەرموێت ئەوانە جەزرەبەیەکی ئەوەندە توندو تیژو گەورە ئەدرێن هەرکەسێ چاوی پێیان بکەوێ سەری سوڕ دەمێنێ چۆن خۆیان ڕادەگرن لە ناویدا بە هەموو سزاو جەزرەبەو زنجیرەی لە ملیاندایە. پەنا بە خوا لەو

---

[1] النساء(١٠).

[2] البخاري(٥٦٣٤)، مسلم(٢٠٦٥).

سزایە. ﴿ ذَٰلِكَ بِأَنَّ ٱللَّهَ نَزَّلَ ٱلْكِتَٰبَ بِٱلْحَقِّ ﴾(ئەو ئازارەش) بۆ ئەوەیە کە خودا بەڕاستی ئەم کتێبەی ناردوە. واتە: بۆیە شایەنی ئەو سزا توندەن، چونکە خودا کتێبی نارد بۆ موحەممەدو(ﷺ) پێغەمبەرەکانی پێش ئەویشی بۆ گەیاندن‌و بەجێهێنانی هەق‌و پوچەڵ کردنەوەی پڕو پوچ ئەوان گاڵتەیان بە نیشانەکانی خودا کرد، کە کتێبەکەیان فەرمانی پێدابوون بە دەرخستنی ئەو زانیاریەو بڵاوکردنەوەی، کەچی ئەوان دژایەتیان کردو بە درۆیان خستەوە ئەم پێغەمبەرە ش(ﷺ) کە دواین پێغەمبەرە بانگی کردن بۆ لای خوداو فرمانی پێدان بە چاکە کردن‌و وازهێنان لە خراپە کاری، بەڵام ئەمان بە درۆیان خستەوەو دژایەتیان کردو حاشایان لێکردو سیفەتەکەیان شاردەوە، گاڵتەیان بەو نیشانانە دەکرد لە خودا ناردویەتی بۆ پێغەمبەرەکەی، بۆیە خودا توشی ئەو سزاو تۆڵە بەژانەی کردن. هەر بۆیە خودای مەزن ئەفەرموێت: ﴿ ذَٰلِكَ بِأَنَّ ٱللَّهَ نَزَّلَ ٱلْكِتَٰبَ بِٱلْحَقِّ ۗ وَإِنَّ ٱلَّذِينَ ٱخْتَلَفُوا۟ فِى ٱلْكِتَٰبِ لَفِى شِقَاقٍۭ بَعِيدٍ ﴾ ئەو(ئازارەیش) بۆ ئەوەیە کە خودا ئەم کتێبەی بە ڕاستی ناردوە، ئەوانەشی وا لەسەر باسی ئەم کتێبە کێشە دەکەن، گێرەو کێشەی دوورو درێژیان تووش دەبێ.

﴿ لَّيْسَ ٱلْبِرَّ أَن تُوَلُّوا۟ وُجُوهَكُمْ قِبَلَ ٱلْمَشْرِقِ وَٱلْمَغْرِبِ وَلَٰكِنَّ ٱلْبِرَّ مَنْ ءَامَنَ بِٱللَّهِ وَٱلْيَوْمِ ٱلْءَاخِرِ وَٱلْمَلَٰٓئِكَةِ وَٱلْكِتَٰبِ وَٱلنَّبِيِّۦنَ وَءَاتَى ٱلْمَالَ عَلَىٰ حُبِّهِۦ ذَوِى ٱلْقُرْبَىٰ وَٱلْيَتَٰمَىٰ وَٱلْمَسَٰكِينَ وَٱبْنَ ٱلسَّبِيلِ وَٱلسَّآئِلِينَ وَفِى ٱلرِّقَابِ وَأَقَامَ ٱلصَّلَوٰةَ وَءَاتَى ٱلزَّكَوٰةَ وَٱلْمُوفُونَ بِعَهْدِهِمْ إِذَا عَٰهَدُوا۟ ۖ وَٱلصَّٰبِرِينَ فِى ٱلْبَأْسَآءِ وَٱلضَّرَّآءِ وَحِينَ ٱلْبَأْسِ ۗ أُو۟لَٰٓئِكَ ٱلَّذِينَ صَدَقُوا۟ ۖ وَأُو۟لَٰٓئِكَ هُمُ ٱلْمُتَّقُونَ ﴿١٧٧﴾ ﴾

### کۆکەرەوەی چاکەکان

ئەم ئایەتە پێك هاتووە لە کۆمەڵێ دەستەواژەی گەورەو دەستووری گشتی‌و بڕوایەکی ڕێك‌و ڕاست، خودای مەزن فەرمان ئەدا بە خاوەن باوەڕان لە سەرەتاوە ڕوو لە قودسی پیرۆز بکەن پاشان وەریگێڕان بۆ کەعبەی پیرۆز، ئەمە لەسەر شانی کۆمەڵێ لە ئەهلی کتێب‌و هەندێ لە موسوڵمانان گران بوو، خودای گەورە لەم ئایەتەدا کە ناردیە خوارەوە باسی لە کارزانی خۆی کرد لەو بارەیەوە، کە مەبەست پێی گوێڕایەڵی خودای مەزن‌و شوێن کەوتنی فەرمانەکانیەتی، ڕوو کردنە هەر شوێنێ کە خوا بیەوێ‌و شوێن کەوتنی پەیامەکەی ئەوە، چاکەو لە خوا ترسیەو بڕوای تەواوە، نەك پابەند بوون بە ڕووکردنە ڕۆژهەڵات یا ڕۆژئاوا چاکەو گوێڕایەڵی بێ، ئەگەر بڕیاری خوداو پەیامەکەی ئەوی لەسەر نەبێ. هەر بۆیە فەرموویەتی: ﴿ لَّيْسَ ٱلْبِرَّ أَن تُوَلُّوا۟ وُجُوهَكُمْ قِبَلَ ٱلْمَشْرِقِ وَٱلْمَغْرِبِ وَلَٰكِنَّ ٱلْبِرَّ مَنْ ءَامَنَ بِٱللَّهِ وَٱلْيَوْمِ ٱلْءَاخِرِ ﴾ کاری چاك هەر ئەوە نیە ڕوو لە ڕۆژهەڵات بکەن یان ڕۆژئاوا، چاك ئەمەیە باوەڕتان بە

خوداو ڕۆژی قیامەت هەبێ. وەك دەربارەی ئاژەڵ سەربڕین و قوربانی ئەفەرموێت: ﴿لَن يَنَالَ ٱللَّهَ لُحُومُهَا وَلَا دِمَآؤُهَا وَلَـٰكِن يَنَالُهُ ٱلتَّقْوَىٰ مِنكُمْ﴾[1] گۆشت و خوێنی ئەوانە بۆ خودا ناچێ، تەنیا هەستی ترستان لە خودایە بەو دەگا. ئەبولعالیە دەڵێت: جوولەکە ڕوویان لە ڕۆژئاوا دەکردو نەسرانیەکانیش ڕوویان لە ڕۆژهەلات دەکرد. خودای مەزنیش فەرمووی: ﴿لَّيْسَ ٱلْبِرَّ أَن تُوَلُّوا۟ وُجُوهَكُمْ قِبَلَ ٱلْمَشْرِقِ وَٱلْمَغْرِبِ﴾ کاری چاك هەر ئەوە نیە ڕوو لە ڕۆژهەلات بکەن یا ڕۆژئاوا، ئەمە قسەی باوەڕو ڕاستی کردارە کە بڕواتان بە خواو ڕۆژی قیامەت هەبێ. هەر بەمجۆرە لە حەسەن و ڕەبیعی کوڕی ئەنەسەوە[2] کەڕیوایەت کراوە سەوری دەڵێت: ﴿وَلَـٰكِنَّ ٱلْبِرَّ مَنْ ءَامَنَ بِٱللَّهِ﴾ چاك ئەمەیە بڕواتان بە خوداو بە ڕۆژی قیامەت هەبێ. ئەمە جۆری چاکەکان هەموویەتی[3] چونکە هەرکەسێ ئەوەی لەم ئایەتە دایە تێدا بێ چووەتە ناو ئیسلام و دەستی گرتووە بە هەموو ئیسلامەوە، هەرچی چاکەیە بە دەستی هێناوە کە باوەڕەبە خودایەبێ هیچ پەرستراوێکی تر بڕواشی هێناوە بە بوونی فریشتەکانی کە نێرراوی خودان لە نێوان خوداو پێغەمبەرەکانیدا ﴿وَٱلْكِتَـٰبِ﴾ بڕواشیان هێناوە بە کتێبەکانی.(الکتاب) ناوی( جنسە) هەموو کتێبەکان دەگرێتەوە کە لە ئاسمانەوە هاتوونە خوارەوە بۆ پێغەمبەران. هەتا بە بەڕێزترین کتێب کۆتایی هاتووە کە قورئانی پیرۆزەو ئاگاداری هەموو کتێبەکانی پێش خۆیەتی و هەرچی چاکەیە تێیدا کۆبوەتەوەو خۆش بەختی دنیاو قیامەتی تێدایە. خودا بەم قورئانە گشت کتێبەکانی تری پێش خۆی نەسخ کردۆتەوە، بڕوای هێناوە بە گشت پێغەمبەرەکان لە یەکەمیانەوە هەتا دواین پێغەمبەریان کە موحەممەدە(ﷺ) پاشان ئەفەرموێت: ﴿وَءَاتَى ٱلْمَالَ عَلَىٰ حُبِّهِۦ﴾ لەو سامانەی هەرچەندە زۆریشتان خۆش دەوێ بەشی بدەن. وەك لە هەردوو سەحیحەکەدا هاتووە لە فەرمودەی ئەبوهورەیرەوە بە مەرفوعی: (چاکترین خێر ئەوەیە کە خێر بکەی لە کاتێکدا لەشت ساغ و ماڵەکەت خۆش بوێ و ڕژد بیت بە هیوای دەوڵەمەندی بیت و لە هەژاری بترسی)[4]، هەرلەم بارەوە خودای مەزن ئەفەرموێت: ﴿وَيُطْعِمُونَ ٱلطَّعَامَ عَلَىٰ حُبِّهِۦ مِسْكِينًا وَيَتِيمًا وَأَسِيرًا ﴿٨﴾ إِنَّمَا نُطْعِمُكُمْ لِوَجْهِ ٱللَّهِ لَا نُرِيدُ مِنكُمْ جَزَآءً وَلَا شُكُورًا﴾[5] لەو خۆراکەی کە خۆیان حەزی لێ دەکەن، بە هەژارو بە هەتیوو بە دیلگیراوی دەبەخشن. ئێمە(هەر لەڕێی خودا) لەم

---

[1] الحج(٣٧).

[2] ابن ابي حاتم غ: (١/٢٥١).

[3] ابن ابي حاتم غ: (١/٢٥٣).

[4] فتح الباري(٣/٣٣٤)، مسلم(٢/٧١٦).

[5] الانسان(٨-٩).

خۆراکەتان ئەدەینێ، نە پاداشتمان لێتان دەوێ‌و نە شوکرانەش. یان ئەفەرموێت: ﴿وَيُؤْثِرُونَ عَلَىٰٓ أَنفُسِهِمْ وَلَوْ كَانَ بِهِمْ خَصَاصَةٌ﴾[1] ئەوان لە پێشتر دەزانن هەرچەندە دەست تەنگیشان هەیە. ئەم کارە گەورەو لەسەر ترە کە ڕێزی ئەوانە ئەدەن بەسەر خۆیانداو خۆشیان زۆر پێویستیان پێی هەیە ئەو ماڵ‌و خواردنەیان کە زۆر لایان خۆشەویستە دەبەخشن لەبەر ڕەزامەندی خوا. ﴿ذَوِي ٱلْقُرْبَىٰ﴾ بە خزمان، واتە: کەس‌و کاری پیاو چونکە ئەوانە لە پێشترن لە بەخشیندا لە کەسانی تر. وەك لەم فەرمودەیەدا هاتوە: (خێر کردن بە هەژاران خێرە، بۆ خزمان دوو جار خێرە، خێریشە پەیوەندی خزمایەتیشە.[2] چونکە ئەوانە لە پێشترین کەسن بە تۆ، لە پێشترن بە چاکەو بەخشینی تۆ) خودای مەزن فەرمانی داوە بە چاکە کردن دەربارەیان لە شوێنی تری کتێبەکەیدا ﴿وَٱلْيَتَـٰمَىٰ﴾ هەتیوان یش. هیچ ئیشێکیان نیەو باوکیان مردوەو منداڵ‌و لاوازن‌و توانای کارکردنیان نیە،(عەبدالرزاق) لە عەلیەوەڕیوایەتی کردوە لە پێغەمبەری خوداوە(ﷺ): (دوای بالغ بوون هەتیوی نیە)[3]، ﴿وَٱلْمَسَـٰكِينَ﴾هەژاران، ئەوکەسانەن ئەوەندەیان نیە بەشیان بکا، لە خواردن‌و جل‌و بەرگ‌و شوێنی نیشتەجێبوون، خێریان پێ ئەدرێت هەتا پێویستی ژیانی خۆیان پێ دەستەبەر بکەن.لە هەردوو سەحیحەکەدا هاتوە، لە ئەبوهورەیرەوە کە پێغەمبەری خودا(ﷺ) فەرموویەتی: (هەژار ئەو کەسە نیە کە دەگەڕێت بەناو خەڵکداوبە خورمایەك یا دوو خورما یان پارویەك یان دوو پارو ڕازی دەکەی. بەڵکو هەژار ئەو کەسەیە کە ئەوەندەی دەست ناکەوێ بێ نیاز بێ، خەڵکیش نایناسن تا خێری پێ بکەن)[4].

﴿وَٱبْنَ ٱلسَّبِيلِ﴾ ڕێبوار، ئەو کەسەیە بە ڕێدا دەڕواتو ئەوەی پێیەتی خەرجی دەکات، ئەوەندەی پێ ئەدرێت تا دەگاتەوە زێدی خۆی. یان کەسێکە دەیەوێ سەفەر بکات لەبەر خودا، ئەوەندەی پێ ئەدرێت بەشی بکات تا دەڕواتو دەگەڕێتەوە. ئەمە میوانیش دەگرێتەوە، وەك عەلی کوڕی ئەبوتەلحە دەڵێت لە ئیبنوعەبباسەوە کە وتویەتی: ڕێبوار ئەو میوانەیە کە دێتە لای موسوڵمانان.[5] واتە: لای دا دەبەزێ. موجاهیدو سەعیدی کوڕی جوبەیرو ئەبوجەعفەری باقرو حەسەن‌و قەتادەو زەححاك‌و

---

[1] الحشر(٩).

[2] أحمد(٢١٤/٤)، فەرموودەیەکی حەسەنە.

[3] عبدالرزاق(٤١٦/٦)، هەتنەکەی حەسەنە.

[4] فتح الباري(٣٩٩/٣)، مسلم(٧١٩/٢).

[5] ابن ابي حاتم غ: (٢٥٩/١).

زەهری و ڕەبیعی کوڕی ئەنەس و موقاتلی کوڕی حەیان هەر وایان وتوە.[1] ﴿وَٱلسَّآئِلِينَ﴾ سوالکەران. ئەوانەی دەگەڕێن و داوا دەکەن هەر زەکات و خێراتیان پێ ئەدرێت ﴿وَفِي ٱلرِّقَابِ﴾ بەندەیشی پێ بکڕنەوە، ئەو بەندانەی نرخێك لەسەر خۆیان دەنووسن کە بیدەن و توانایان نیە ئەم ماڵە پەیدا بکەن، ئەوانەش خێرو زەکاتیان پێ ئەدرێت تا بیدەن بە خاوەنەکانیان و ئازاد بکرێن. باسی ئەم جۆرانە لە ئایەتی زەکاتدا لە سورەتی بەرائەتدا بەو زوانە بە درێژی قسەی لەسەر دەکرێ( بە ویستی خوا)، ﴿وَأَقَامَ ٱلصَّلَوٰةَ﴾ نوێژ دەکەن. واتە: بە چاکترین شێوە نوێژەکانیان دەکەن لە کاتی خۆیداو بە ڕکوع و سوژدە بردن و لەسەرخۆیی و ملکەچیەوەو بە پێی مەرجە شەرعیەکان بە چاکی پێی هەڵدەسن ﴿وَءَاتَى ٱلزَّكَوٰةَ﴾ زەکات ئەدەن، مەبەست پێی زەکاتی دارایی یە وەك سەعیدی کوڕی جوبەیرو موقاتلی کوڕی حەیان وتویانە.[2] پاشان خودای مەزن ئەفەرموێت: ﴿وَٱلْمُوفُونَ بِعَهْدِهِمْ إِذَا عَٰهَدُوا۟﴾ هەر کاتێکیش پەیمانێك دەبەستن نایشکێنن، وەك ئەم ئایەتە کە ئەفەرموێت: ﴿ ٱلَّذِينَ يُوفُونَ بِعَهْدِ ٱللَّهِ وَلَا يَنقُضُونَ ٱلْمِيثَٰقَ﴾[3] ئەو کەسانەی پەیمانی خودا بەجێ دێنن و ئیتر لێی پەشیمان نابنەوە. پێچەوانەی ئەمە ڕەوشتی دووڕووەکانە. وەك لە فەرموودەی سەحیحدا هاتوە: (نیشانەی دووڕوو سێ شتە: ئەگەر قسەی کرد درۆ بکا، ئەگەر بەڵێنی دا نەیباتە سەر، ئەگەر سپاردەی لا دانرا ناپاکی لێ بکات).[4] لە فەرموودەیەکی تریشدا هاتوە: (ئەگەر قسەی کرد درۆ بکا، ئەگەر پەیمانی دا بیشکێنێ، ئەگەر دژایەتی کەسێکی کرد لە هەق لابداو ستەمی لێبکات)[5]، ﴿وَٱلصَّٰبِرِينَ فِي ٱلْبَأْسَآءِ وَٱلضَّرَّآءِ وَحِينَ ٱلْبَأْسِ﴾ لە نەداری و گرفتاری و تەنگانەدا خۆڕاگرن. واتە: لە کاتی هەژاری و نەخۆشی و ڕووبەڕووبونەوەو شەڕ کردن لەگەڵ دوژمندا خۆڕاگرن(ئەمە قسەی ئیبنومەسعودو ئیبنوعەبباس و ئەبولعالیەیە،[6] سوڕەی هەمەدانیش هەر وای وتوە[7] موجاهیدو سەعیدی کوڕی جوبەیرو حەسەن و قەتادەش هەر وایان وتوە[8]

---

[1] ابن ابي حاتم غ: (١/٢٦٠).

[2] ابن ابي حاتم غ: (١/٢٦٤).

[3] الرعد(٢٠).

[4] مسلم(١/٧٨).

[5] مسلم(١/٧٨).

[6] ابن ابي حاتم غ: (١/٢٧٠).

[7] ابن ابي حاتم غ: (١/٢٧١).

[8] ابن ابي حاتم غ: (١/٢٧٠).

ڕەبیعی کوڕی ئەنەس‌و سودی‌و موقاتلی کوڕی حەیان‌و ئەبومالیك[1] کەسانی تریش هەر وایان وتوە[2] هەر بۆیە(الصابرین)ی مەنسوب کردوە بۆ(مەردمە)وهاندانە بۆ خۆڕاگری لەو کاتانەدا لەبەر گرانی‌و ناڕەحەتیان کە. هەر پەنا بە خودا دەبرێ‌و هەر ئەودەبێتە پشتیوانە، ﴿أُوْلَٰٓئِكَ ٱلَّذِينَ صَدَقُواْ﴾ مرۆڤی بەڕاستی ئەوانەن. واتە ئەو کەسانەی ئەم سیفاتانەیان تێدایە هەر ئەوان لە بڕواکەیاندا ڕاستیان کردوە، چونکە ئەوانە بڕوای ناو دڵیان دەرخستوە بە کردارو گفتاریان، هەر ئەوانەش ڕاستیان کردوە ﴿وَأُوْلَٰٓئِكَ هُمُ ٱلْمُتَّقُونَ﴾ دیارەئەوانەی لە خوا ترسن، چونکە خۆیان لە قەدەغە کراوەکان پاراستوەو فەرمانەکانی خودایانجێبەجێ کردووە.

﴿ يَٰٓأَيُّهَا ٱلَّذِينَ ءَامَنُواْ كُتِبَ عَلَيْكُمُ ٱلْقِصَاصُ فِي ٱلْقَتْلَى ٱلْحُرُّ بِٱلْحُرِّ وَٱلْعَبْدُ بِٱلْعَبْدِ وَٱلْأُنثَىٰ بِٱلْأُنثَىٰ فَمَنْ عُفِيَ لَهُۥ مِنْ أَخِيهِ شَيْءٌ فَٱتِّبَاعٌۢ بِٱلْمَعْرُوفِ وَأَدَآءٌ إِلَيْهِ بِإِحْسَٰنٍ ذَٰلِكَ تَخْفِيفٌ مِّن رَّبِّكُمْ وَرَحْمَةٌ فَمَنِ ٱعْتَدَىٰ بَعْدَ ذَٰلِكَ فَلَهُۥ عَذَابٌ أَلِيمٌ ﴿١٧٨﴾ وَلَكُمْ فِي ٱلْقِصَاصِ حَيَوٰةٌ يَٰٓأُوْلِي ٱلْأَلْبَٰبِ لَعَلَّكُمْ تَتَّقُونَ ﴿١٧٩﴾﴾

## فەرماندان بە تۆڵە سەندنەوەو ڕوون کردنەوەی ئەو بەرژەوەندیانەی کە تیایەتی

خودای مەزن ئەفەرموێت، لە تۆڵە سەندنا دادگەریتان لەسەر بڕیار دراوە ئەی خاوەن باوەڕان،ئازاد لە تۆڵەی ئازاد کۆیلە لە تۆڵەی کۆیلەو مێینە لە تۆڵەی مێینە، لە سنوور دەرمەچن‌و دەست درێژی مەکەن، وەك چۆن لە پێشا کردویانەو فەرمانی خوایان گۆڕیوە دەربارەیان. ئەوە بووهۆی هاتنەخوارەوەی ئایەتەکەش بەنونەزیر غەزای بەنوقورەیزەی لە چەرخی نەفامیدا کردوەو تێکیان شکاندون، ئەگەر نەزیریەکان قورەیزیەکیان بکوشتایە، لە تۆڵەیدا نەدەکوژرایەوە. بەڵکو فیدیەکەی سەد ویسق خورما بووە. خۆ ئەگەر قەرەزیە نەزیریەکی بکوشتایە دەکوژرایەوە. ئەگەر فیدیەش بدرایە بە دوو سەد ویسق خورما فیدیەکەی ئەدرا. دوو قاتی فیدیەی قەرەزیەکە بوو. خودای مەزن فەرمانی دا کە دادگەری بەکار بێنن لە تۆڵە سەندنداو شوێنی ئەو خراپە کارو لادەرو بەدانە نەکەون کە دژی بڕیاری خودان بە خوانەناسی‌و لاساری ﴿ يَٰٓأَيُّهَا ٱلَّذِينَ ءَامَنُواْ كُتِبَ عَلَيْكُمُ ٱلْقِصَاصُ فِي ٱلْقَتْلَى ٱلْحُرُّ بِٱلْحُرِّ وَٱلْعَبْدُ بِٱلْعَبْدِ وَٱلْأُنثَىٰ بِٱلْأُنثَىٰ﴾ ئەی کۆمەڵی خاوەن باوەڕان، لەسەر ئەوانەی کوژران تۆڵەمان بۆ بڕیار داون، ئازادلە تۆڵەی ئازادو کۆیلە لە تۆڵەی کۆیلەو مێینە لە بری مێینە.بەڵام ئەم دەقەی کە خودای مەزن ئەفەرموێت: ﴿ٱلْحُرُّ بِٱلْحُرِّ وَٱلْعَبْدُ بِٱلْعَبْدِ وَٱلْأُنثَىٰ بِٱلْأُنثَىٰ﴾ نەسخ بوەتەوە. گیان بە گیان نەسخی کردۆتە.

---

[1] ابن ابي حاتم غ: (٢٧١/١).

[2] الطبري(٣٥٥/٣).

کۆی زانایان لەسەر ئەوەن کە موسوڵمان بە خوانەناس ناکوژرێتەوە. وەك بوخاری هێناویەتی لە عەلیەوە(ڕەزای خوای لێ بێ) دەڵێت: پێغەمبەری خودا(ﷺ) فەرموویەتی: (موسوڵمان بە خوانەناس ناکوژرێ)[1]، هیچ فەرموودەیەکی سەحیحو تەفسیرێکی ترنیە دژی ئەمە بێت. بەڵام ئەبوحەنیفە دەڵێ کە دەکوژرێ پێی بە عمومی ئایەتی مانیدە.

**مەسەلەیەك**

ڕێبازی چوار پێشەواکەو کۆی زانایان لەسەر ئەوەن کە کۆمەڵێ بە یەك کەس دەکوژرێتەوە. عومەر دەربارەی لاوێك حەوت کەسی کوشتبوو یان دەڵێت: ئەگەر هەموو خەڵکی(سەنعا) دەستیان لە کوشتنیداهە بوایە دەمکوشتنەوە لە بریدا. لە زەمانی عومەر خۆیدا نەبیسراوە کە هاوەڵەکانی دژی ئەمەوەستا بن، ئەمەیش وەك کۆدەنگی وایە. ڕیوایەتێك لەئیمامی ئەحمەدەوە دەگێڕنەوە: کە کۆمەڵێك بە یەك کەس ناکوژرێتەوە. یان یەك کەس بە یەك کەس نەبێ ناکوژرێتەوە. ئیبنومونزیر گێڕاویەتەوە لە مەعازو ئیبنوزوبەیرو عەبدولمەلیکی کوڕی مەڕوانو زەهریو ئیبنوسیرینو حەبیبی کوڕی ئەبوسابیتەوە. پاشان خودای مەزن ئەفەرموێت: ﴿فَمَنْ عُفِيَ لَهُ مِنْ أَخِيهِ شَيْءٌ فَاتِّبَاعٌ بِالْمَعْرُوفِ وَأَدَاءٌ إِلَيْهِ بِإِحْسَانٍ﴾ هەرکەسێ لە برای هاوئاینی خۆی دەس لە خوێن سەندن هەڵگرێ، دەبێ بەپێی دابی ڕۆژ بجوڵێتەوەو بە خۆشی خۆی خوێنەکە بدات. لێبوردن ئەوەیە: کە خوێن بایی(الدية) وەربگیرێ لە کوشتنی ئەنقەستدا. هەر بەم جۆرە ڕیوایەت کراوە لە ئەبولعالیەو ئەبوشەعسادو موجاهیدو[2] سەعیدی کوڕی جوبەیرو[3] عەتاو[4] حەسەنو[5] قەتادەو[6] موقاتیلی کوڕی حەیان[7]. زەححاك دەڵێت لە ئیبنوعەبباسەوە ﴿فَمَنْ عُفِيَ لَهُ مِنْ أَخِيهِ شَيْءٌ﴾ هەرکەسێ بەخشرا لە برایەکی ئاینی خۆیەوە بە شتێك. واتە: خوێن بایی(الدية) وەرگرێت دوای ڕوابوونی هەقی خۆی ئەوە لێبوردنە[8]، ﴿فَاتِّبَاعٌ

---

[1] البخاري(١١١).

[2] ابن ابي حاتم غ: (١/٢٧٨).

[3] ابن ابي حاتم غ: (١/٢٧٩).

[4] ابن ابي حاتم غ: (١/٢٧٨).

[5] ابن ابي حاتم غ: (١/٢٧٩).

[6] الطبري(٣/٣٦٨).

[7] ابن ابي حاتم غ: (١/٢٧٩).

[8] ابن ابي حاتم غ: (١/٢٨٠).

بِٱلْمَعْرُوفِ ﴾ دەبێ بە پێی دابی ڕۆژ بجوڵێتەوە کاتێ کە خوێنگری قبووڵ کرد ﴿وَأَدَآءٌ إِلَيْهِ بِإِحْسَٰنٍ ﴾ بکوژەکەیش بە خۆشی خۆی خوێن بایی بدات بە بێ مشتو مڕو کێشمە کێشم.

### خاوەنی خوێن یەکێ لەم سێ تایبەتمەندیەی بۆ هەیە

خودای مەزن ئەفەرموێت: ﴿ذَٰلِكَ تَخْفِيفٌ مِّن رَّبِّكُمْ وَرَحْمَةٌ﴾ ئەم بڕیارە لە پەروەردگاری ئێوەیەو سووکبار یەو بەزەییە بەرانبەر بە ئێوە. خودای گەورەکە ئەم خوێنگرن یەی بڕیار داوە بۆ ئێوە لە کوشتنی ئەنقەستدا بۆ سووکباری ئێوەیەو بەزەیی خۆیەتی دەربارەتان. چونکە لەسەر گەلەکانی پێش ئێوە کوشتن یان لێبوردن بڕیار بووە بۆیان، وەك سەعیدی کوڕی مەنسور ڕیوایەتی کردوە لە ئیبنوعەبباسەوە دەڵێت: تۆڵە سەندن لە کوشتندا لەسەر نەوەی ئیسرائیل نوسرا بوو. لێبوردن لە نێوانیاندا نەبوو. خودای مەزن بەم ئوممەتەی فەرمووە: ﴿ يَٰٓأَيُّهَا ٱلَّذِينَ ءَامَنُوا۟ كُتِبَ عَلَيْكُمُ ٱلْقِصَاصُ فِى ٱلْقَتْلَى ٱلْحُرُّ بِٱلْحُرِّ وَٱلْعَبْدُ بِٱلْعَبْدِ وَٱلْأُنثَىٰ بِٱلْأُنثَىٰ فَمَنْ عُفِىَ لَهُۥ مِنْ أَخِيهِ شَىْءٌ ﴾ لەسەر ئەوانە کوژراون تۆڵەمان بۆ بڕیار داون،ئازاد لە تۆڵەی ئازادو کۆیلە لە تۆڵەی کۆیلەو مێینە لە بری مێینە هەرکەسیش لە برای هاوئاینی خۆی دەست لە خوێنگری هەڵدەگرێ بە شتێ. لێبوردن(العفو) واتە: خوێنگری وەردەگرێت لە کوشتنی ئەنقەستدا.[1] ئیبنوحەبانیش لە سەحیحەکەیدا هێناویەتی[2]. قەتادە دەڵێت: ﴿ذَٰلِكَ تَخْفِيفٌ مِّن رَّبِّكُمْ ﴾ ئەمە سووك کردنێکە لە پەروەردگارتانەوە، ئەمە بەزەیی خودایە بەم ئوممەتە کە خواردنی خوێنگری بۆ ڕوا کردون، بۆ هیچ کەسێکی تری پێش ئەمانی ڕەوا نەکردوە، ئەهلی تەورات تەنیا تۆڵە سەندنو لێبوردنی بۆ ڕوا کرا بوو. خوێنگری لە نێوانیاندا نەبوو. ئەهلی ئینجیلیش فەرمانی لێبوردنیان پێدرا بوو. بەڵام بۆ ئەم ئوممەتە بڕیاری تۆڵەو لێبوردنو خوێنگریش دراوە، هەر بەم شێوەیە لە سەعیدی کوڕی جوبەیرو موقاتیلی کوڕی حەیان[3] و ڕەبیعی کوڕی ئەنەسیشەوە ڕیوایەت کراوە[4].

﴿فَمَنِ ٱعْتَدَىٰ بَعْدَ ذَٰلِكَ فَلَهُۥ عَذَابٌ أَلِيمٌ ﴾ هەرکەسێ دوای ئەمە دەست درێژی کرد، بەشی جەزرەبەی بە ژانە. واتە: هەرکەسێ دوای خوێنگری یان قبووڵی خوێنگری کردپاشان کەسێکی کوشت، ئەو کەسە سزای توندو بە ژان ئەدرێت، هەر بەم جۆرە لە ئیبنوعەبباس ڕیوایەت کراوە[5]، موجاهیدو عەتاو

---

[1] سنن سعيد بن منصور(٢/٦٥٢).

[2] صحيح إبن حبان(٧/٦٠١).

[3] ابن ابي حاتم غ: (١/٢٨٤).

[4] ابن ابي حاتم غ: (١/٢٨٥).

[5] ابن ابي حاتم غ: (١/٢٨٧-٢٨٩).

عیکرمەو حەسەن‌و[1] قەتادەو ڕەبیعی کوڕی ئەنەس‌و سوودی‌و موقاتیلی کوڕی حەیان ئەوەی کەسێ دەکوژێ دوای وەرگرتنی خوێنگری سزای توندو بە ژان ئەدرێت[2].

## سوودی تۆڵە سەندن و حیکمەتەکەی

خودای مەزن ئەفەرموێت: ﴿وَلَكُمْ فِي ٱلْقِصَاصِ حَيَوٰةٌ يَٰٓأُو۟لِي ٱلْأَلْبَٰبِ لَعَلَّكُمْ تَتَّقُونَ﴾ ئەی خاوەنی دڵانی وشیار ژیانتان بە تۆڵەوە بەندە، بەڵکو خۆتان بپارێزن. خودای مەزن کە تۆڵە سەندنی بڕیارداوە بۆتان(کە کوشتنەوەی بکوژە) لە کارزانیەکی گەورەیە بۆتان کە هێشتنەوەو پاراستنی گیانە. چونکە ئەگەر پیاو کوژ زانی دەکوژێ واز لەو کارەی دێنێ، ئەمەیش خۆی ئەبێ بە ژیان بۆ خەڵکی، لە کتێبە پێشوەکانیشدا ئەوەهاتووەکە کوشتنەوە کوشتن نامێڵێ(القتل أنفى للقتل) ئەم دەقە بە ڕوونی وڕاشکاوی‌و کورت تر لە قورئاندا هاتووە: ﴿وَلَكُمْ فِي ٱلْقِصَاصِ حَيَوٰةٌ﴾ ژیانتان بە تۆڵەوە بەندە. ئەبولعالیە دەڵێت: خودا تۆڵە سەندنی کردۆتە مایەی ژیان، ئەوەی‌دەیەوێ خەڵکی بکوژێ، تەنیا ترسێ کوشتنەوە ڕێگریی لێ دەکات. هەر وا ڕیوایەت کراوە لە سەعیدی کوڕی جوبەیرو[3] ئەبومالیک‌و[4] حەسەن‌و قەتادەو ڕەبیعی کوڕی ئەنەس‌و موقاتیلی کوڕی حەیانەوە[5] ﴿يَٰٓأُو۟لِي ٱلْأَلْبَٰبِ لَعَلَّكُمْ تَتَّقُونَ﴾ ئەی خاوەن دڵانی وشیار،بەڵکو خۆتان بپارێزن. واتە: بەڵکو لە خوا بترسن‌و دوورکەونەوە لە قەدەغە کراوەکانی خوداو گوناهەکان.(التقوى) ناوێکی گشتگیرە بۆ ئەنجا مدانی خوا پەرستیەکان‌و وازهێنان لە خراپەکاری.

﴿كُتِبَ عَلَيْكُمْ إِذَا حَضَرَ أَحَدَكُمُ ٱلْمَوْتُ إِن تَرَكَ خَيْرًا ٱلْوَصِيَّةُ لِلْوَٰلِدَيْنِ وَٱلْأَقْرَبِينَ بِٱلْمَعْرُوفِ ۖ حَقًّا عَلَى ٱلْمُتَّقِينَ ﴿١٨٠﴾ فَمَنۢ بَدَّلَهُۥ بَعْدَمَا سَمِعَهُۥ فَإِنَّمَآ إِثْمُهُۥ عَلَى ٱلَّذِينَ يُبَدِّلُونَهُۥٓ ۚ إِنَّ ٱللَّهَ سَمِيعٌ عَلِيمٌ ﴿١٨١﴾ فَمَنْ خَافَ مِن مُّوصٍ جَنَفًا أَوْ إِثْمًا فَأَصْلَحَ بَيْنَهُمْ فَلَآ إِثْمَ عَلَيْهِ ۚ إِنَّ ٱللَّهَ غَفُورٌ رَّحِيمٌ ﴿١٨٢﴾﴾

## فەرماندان بە وەسیەت کردن بۆ باوك‌و دایك‌و خزمان‌و پاشان نەسخ بوونەوەی بۆ هەقی میراتگران

﴿كُتِبَ عَلَيْكُمْ إِذَا حَضَرَ أَحَدَكُمُ ٱلْمَوْتُ إِن تَرَكَ خَيْرًا ٱلْوَصِيَّةُ لِلْوَٰلِدَيْنِ وَٱلْأَقْرَبِينَ بِٱلْمَعْرُوفِ﴾ بۆتان نووسراوە، ئەگەرکەسێك لە ئێوە هاتە سەر مردن‌و ماڵێکی لە پاشی دەمێنێ بە حۆرێکی خوا

---

[1] ابن ابي حاتم غ: (١/٢٨٧).

[2] ابن ابي حاتم غ: (١/٢٨٨).

[3] ابن ابي حاتم غ: (١/٢٩١).

[4] ابن ابي حاتم غ: (١/٢٩٢).

[5] ابن ابي حاتم غ: (١/٢٩٠-٢٩٢).

پەسەند وەسیەت بکات، لە باب‌و دایك‌و خزمانی هەر کەسە بەشی خۆی پیٚ بگا. ئەم ئایەتە پیرۆزە پێکهاتووە لە فەرماندان بە وەسیەت کردن بۆ باب‌و دایك‌وخزمان، ئەمە واجب بووە پێش هاتنە خوارەوەی ئایەتی میرات، کاتیٚ کە ئایەتی(فەرائین) هاتە خوارەوە، ئەمە(نەسخ) بووەوە‌و وایلیٚهات میرات دیاری کرا وەك فەرزێك لە لایەن خوداوە، کەسوکارەکەی وەریان گرت بەبیٚ وەسیەت کردن، هیچ منەتێکی وەسیەتەکەی تێدا نەما. هەر بۆیە لەم فەرموودەدا کە لە سونەن‌و جگە لە سونەنەکانیشدا هاتووە لە عەمری کوڕی خاریجەوە، دەڵێت: لە پێغەمبەری خوداوەم بیستم(ﷺ) وتاری ئەدا ئەیفەرموو: (بێگومان خودا هەقی هەموو خاوەن هەقەکانی داوە، وەسیەت کردن بۆ میراتگر نیە)، ئیمامی ئەحمەد ڕیوایەتی کردوە لە موحەممەدی کوڕی سیرینەوە، دەڵێت: ئیبنوعەبباس دانیشت دەستی کرد بە خوێندنی سوورەتی بەقەرە هەتا گەیشتە ئەم ئایەتە ﴿إِن تَرَكَ خَيْرًا ٱلْوَصِيَّةُ لِلْوَٰلِدَيْنِ وَٱلْأَقْرَبِينَ﴾ ئەگەر ماڵێکی لە دوای بەجێهێشت، وەسیەت بکات لە باب‌و دایکی‌و خزمانی هەر کەسیٚ بەشی خۆی پیٚ بگات. دەڵێت: ئەم ئایەتە( نەسخ) بووەوە. هەر وا سەعیدی کوڕی مەنسوور‌و حاکیم لە مستەدرەکەکەیدا ڕیوایەتیان کردوە[1]، ئیبنوئەبی حاتەم ڕیوایەتی کردوە لە ئیبنوعەبباسەوە لەم دەقەدا کە خودای مەزن ئەفەرموێت: ﴿ٱلْوَصِيَّةُ لِلْوَٰلِدَيْنِ وَٱلْأَقْرَبِينَ﴾ وەسیەت بکات بۆ باوك‌و دایك‌و خزمانی. ئەم ئایەتە نەسخی کردەوە کە ئەفەرموێت: ﴿لِّلرِّجَالِ نَصِيبٌ مِّمَّا تَرَكَ ٱلْوَٰلِدَانِ وَٱلْأَقْرَبُونَ وَلِلنِّسَآءِ نَصِيبٌ مِّمَّا تَرَكَ ٱلْوَٰلِدَانِ وَٱلْأَقْرَبُونَ مِمَّا قَلَّ مِنْهُ أَوْ كَثُرَ نَصِيبًا مَّفْرُوضًا﴾[2] لە کەلەپووری دایك‌و باب‌و خزمی نزیك(کەم بیٚ یان زۆر) نێرینە بەشی خۆی هەیە‌و مێینەش بەشی خۆی هەیە بەشیان بۆ بڕیار دراوە. پاشان ئیبنوئەبی حاتەم دەڵێت لە ئیبنوعومەر‌و ئەبومووسا‌و سەعیدی کوڕی موسەیب‌و حەسەن[3] موجاهید‌و عەتا‌و سەعیدی کوڕی جوبەیر‌و موحەممەدی کوڕی سیرین[4] عیکرمە‌و[5] زەیدی کوڕی ئەسلەم‌و ڕەبیعی کوڕی ئەنەس[6] قەتادە‌و سوودی‌و موقاتیلی کوڕی حەیان‌و[7] تاوس‌و[1] ئیبراهیمی نەفەعی‌و شورەیح‌و زەححاك‌و زوهری: ڕیوایەت کراوە: کە ئەم ئایەتە ئایەتی بە میرات نەسخ کراوەتەوە.

---

[1] سعيد بن منصور(٢/٦٦٣)، الحاكم(٢٧٣).

[2] النساء(٧).

[3] ابن ابي حاتم غ: (١/٣٠١).

[4] ابن ابي حاتم غ: (١/٣٠٢).

[5] الطبري(٣/٣٩١).

[6] ابن ابي حاتم غ: (١/٣٠٢).

[7] ابن ابي حاتم غ: (١/٣٠٣).

## وەسیەت بۆ خزمی کە میرات نایگریتەوە

ئەو خزمانە ماوەتەوە کە میرات وەرناگرن، سونەتە وەسیّتیان بۆ بکریّ لە سیّ یەکا وەك نزیکەیەك لە ئایەتی وەسیّت گشتگیری ئایەتەکە، وەك لە هەردوو سەحیحەکەدا هاتووە لە ئیبنوعومەرەوە دەڵیّت: پیّغەمبەری خودا(ﷺ) فەرموویەتی: (هیچ موسوڵمانیّ هەقی نیە کە شتیّکی هەبیّ پیّویستی بە وەسیەت بیّت دوو شەوی بەسەردا تیّپەڕیّت مەگین وەسیّتیّك لەلای خۆی نووسیبیّتی)، ئیبنوعومەر دەڵیّت: لەو کاتەوە ئەمەم لە پیّغەمبەری خودا(ﷺ)بیستووە کە ئەیفەرموو: هیچ شەویّکم بەسەردا تیّنەپەڕیوە مەگین وەسیەتەکەم لەلای خۆم داناوە.[2] ئایەتو فەرموودەی زۆریش هاتوە دەربارەی فەرماندان بە خیّرو چاکە کردن لەگەڵ خزماندا.

## وەسیەت بە چاکەکردن

﴿بِٱلۡمَعۡرُوفِۖ حَقًّا عَلَى ٱلۡمُتَّقِينَ﴾ بە جوانیو ڕیّكو پیّكی، پارێزکاران پیّویستە ئەو کارە بکەن. مەبەست(المعروف) ئەوەیە کە وەسیەت بکات بۆ ئەو خزمانەی میراتیان بەرناکەویّ، خاوەن بەشەکان بیّ بەش نەکا ت،نە زیادەڕەوی بکاتو نە دەست قوچاویش بیّ، وەك لە هەردوو سەحیحەکەدا هاتووە لە سەعدەوە، دەڵیّت: ئەی پیّغەمبەری خودا(ﷺ) من کەسیّکی دارام، کەسیش نیە میراتم لیّ بگریّت جگە لە تەنیا کچیّك، ئایا دروستە دوو(سیّ) یەکی ماڵەکەم بکەم بە خیّر؟ فەرمووی: (نەخیّر) وتم: ئەی نیوەی بکەم بە خیّر؟ فەرمووی: (نەخیّر) دەڵیّت: ئەی سیّ یەك؟ فەرمووی: (سێیەکی بکە، سێیەکیشی زۆرە، تۆئەگەر پاشی خۆت میراتگرەکانت بە دەوڵەمەندی بەجیّ بیّڵی باشترە لەوەی بە هەژاری جیّیان بیّڵی ودەست لە خەڵکی پان بکەنەوە)[3]، وە لە سەحیحی بوخاریشدا هاتووە ئیبنوعەبباس دەڵیّت: ئەگەر خەڵکی چاوپۆشیان بکردایە لە سیّ یەکەوە بۆ چواریەك(باشتر بوو)، چونکە پیّغەمبەر(ﷺ) سیّ یەك سیّ یەکیش زۆرە)[4]، پاشان خودای مەزن ئەفەرمویّت: ﴿فَمَنۢ بَدَّلَهُۥ بَعۡدَ مَا سَمِعَهُۥ فَإِنَّمَآ إِثۡمُهُۥ عَلَى ٱلَّذِينَ يُبَدِّلُونَهُۥٓۚ إِنَّ ٱللَّهَ سَمِيعٌ عَلِيمٌ﴾ ئیتر هەرکەسیّ دوای بیستنی وەسیەتەکە دەستکاری بکاتو بیگۆڕیّ، ئەو کەسانەی کە دەیگۆڕن تاوانبارن. خودا بیسەرو زانایە. خودای گەورە ئەفەرمویّت: هەرکەسیّ وەسیەتەکە بگۆڕیّو دەستکاری بکات، بڕیارەکەی بگۆڕیّ بە زیادکردنی یان کەم کردنەوەی، ئەوە زیاتر دەبیّتە هۆی شاردنەوەی وەسیەتەکە ﴿فَإِنَّمَآ إِثۡمُهُۥ عَلَى ٱلَّذِينَ يُبَدِّلُونَهُۥٓ﴾ ئەو

---

[1] الطبري(٣/٣٨٩).

[2] فتح الباري(٥/٤١٩).

[3] فتح الباري(٥/٧٢٤)، مسلم(٣/١٢٥٠).

[4] البخاري(٢٧٤٣).

کەسانەی کەدەیگۆڕن تاوانبارن. ئیبنوعەبباس‌وکەسانی تریش وتویانە: پاداشتی مردوەکە دەکەوێتەی لای خودا، گوناهەکە پەیوەندی بەو کەسانەوە هەیە کە گۆڕیویانە[1]. ﴿إِنَّ ٱللَّهَ سَمِيعٌ عَلِيمٌ﴾ خودا بیسەرو زانایە. واتە: خودا ئاگاداری ئەو وەسیەتەیە مردوەکە کردویەتی، خودا دەزانێ ئەوانە گۆڕیویانە کە وەسیەتەکەیان بۆ کراوە.پاشان خودای مەزن ئەفەرموێت: ﴿فَمَنْ خَافَ مِن مُّوصٍ جَنَفًا أَوْ إِثْمًا﴾ هەرکاتێ کەسێ هەستی پێکرد کە وەسیەتکار لەو وەسیەتەی کردویەتی ناهەق بووە خۆی تووشی گوناه کردوە. ئیبنوعەبباس‌و[2] ئەبولعالیەو موجاهیدو زەحاك‌و ڕەبیعی کوڕی ئەنەس‌و سوودی وتیان: (الجنف) واتە هەڵە[3] ئەمە گشت هەڵەیەك دەگرێتەوە. وەك ئەوە میراتگرێك بۆ خۆی زیاد بکات بەهۆیەکەوە، وەك ئەوە کە وەسیەتی کردبێ بە فرۆشتنی شتێ بە فلان لەبەر خۆشەویستی لە نێوانیاندا. یان وەسیەتی کردبێ بۆ کوڕی کچەکەی بۆ ئەوەی زیاتری بداتێ، تا لەم جۆرە هۆکارانە. با ئەمە بە هەڵەش بێ بە ئەنقەست نەبێ، بەڵکو ئەو کەسە هەر سروشتی وایەو زۆر بە سۆزەو وردنابێتەوە لەو کارەی کردوویەتی، یان هەر بە ئەنقەست‌و خۆی گوناهبار دەکات لەو وەسیەتەدا کە کردویەتی. لەسەر ئەو کەسە وەسیەتەکەی لادەکرێ، ئەو وەسیەتە ڕاست بکاتەوەو بیخاتەوە سە ڕێبازی شەرعی‌و لابدا لەوەی کە مردوەکە وەسیەتی پێکردوە بۆ ئەوەی لەو وەسیەتەوە نزیکتر بێ‌و لەو بچێت، واتە ڕێکبخرێ لە نێوان نیەتی وەسیەت کەرو ڕێبازی شەرعیدا، ئەم چاکسازی‌و هاوکاریە ناچێتە ڕیزی دەستکاری‌و گۆڕینەوە. بۆیە خودای گەورە ئەفەرموێت: ﴿فَأَصْلَحَ بَيْنَهُمْ فَلَآ إِثْمَ عَلَيْهِ ۚ إِنَّ ٱللَّهَ غَفُورٌ رَّحِيمٌ﴾ تێبکۆشێ میراتگران یەکبخات هیچ گوناهی نیە، خودا لە گوناه دەبورێ‌و دلۆڤانە.

### گەورەیی دادگەری لە وەسیەتدا

عەبدوڕەزاق ڕیوایەتی کردوە لەئەبوهورەیرەوە دەڵێت: پێغەمبەری خودا(ﷺ) فەرموویەتی: (پیاوی وا هەیە کار دەکات بە کاری ئەهلی خێر حەفتا ساڵ، کاتێ کە وەسیەت دەکات ناهەقی دەکات تێیدا، کۆتایی کردەوەکەی بە کردەوەی خراپ دێت. پیاوی واش هەیە کار دەکات بە کاری ئەهلی شەڕ حەفتا ساڵ، پاشان دادگەرە لە وەسیەتەکەیدا، کۆتایی کردەوەکەی بە کردەوەی چاك دێت، دەچێتە بەهەشت) ئەبوهورەیرە دەڵێت: ئەگەر حەز دەکەن ئەم ئایەتە بخوێننەوە: ﴿تلك حدود الله فلا تعتدّوها﴾[4].

---

[1] الطبري(٣/٢٩٧).
[2] ابن ابي حاتم غ: (١/٣١٠).
[3] ابن ابي حاتم غ: (١/٣١١).
[4] عبدالرزاق(٩/٨٨).

﴿ يَٰٓأَيُّهَا ٱلَّذِينَ ءَامَنُواْ كُتِبَ عَلَيۡكُمُ ٱلصِّيَامُ كَمَا كُتِبَ عَلَى ٱلَّذِينَ مِن قَبۡلِكُمۡ لَعَلَّكُمۡ تَتَّقُونَ ﴿١٨٣﴾ أَيَّامٗا مَّعۡدُودَٰتٖۚ فَمَن كَانَ مِنكُم مَّرِيضًا أَوۡ عَلَىٰ سَفَرٖ فَعِدَّةٞ مِّنۡ أَيَّامٍ أُخَرَۚ وَعَلَى ٱلَّذِينَ يُطِيقُونَهُۥ فِدۡيَةٞ طَعَامُ مِسۡكِينٖۖ فَمَن تَطَوَّعَ خَيۡرٗا فَهُوَ خَيۡرٞ لَّهُۥۚ وَأَن تَصُومُواْ خَيۡرٞ لَّكُمۡ إِن كُنتُمۡ تَعۡلَمُونَ ﴿١٨٤﴾ ﴾

خودای مەزن ڕووی وتاری دەکاتە خاوەن باوەڕانی ئەم ئوممەتەو فەرمانیان پێدەکات بە ڕۆژو گرتن، کە بریتیە لە خۆ گرتنەوە لە خواردن و خواردنەوەو سەرجێیکردن بە نیەتێکی پاك بۆ خودای مەزن، چونکە ڕۆژوو دڵەکان پاکو خاوێن دەکاتەوە لە شتی خراپو ڕەوشتی پیس و ناشیرین، هەروەها فەرموویەتی وەك چۆن لەسەر ئەمانی بە فەرز داناوە لەسەر گەلە پێشوەکانیشی دانابوو. ئەمان بە شوێنی ئەواندا دەچن تێیدا. با ئەمان زۆر کۆشش بکەن لە بەجێهێنانی ئەم فەرزەدا بە تەواوی و ڕێك و پێکتر لەوانەی پێش خۆیان. وەك خودای گەورە ئەفەرموێت: ﴿لِكُلّٖ جَعَلۡنَا مِنكُمۡ شِرۡعَةٗ وَمِنۡهَاجٗاۚ وَلَوۡ شَآءَ ٱللَّهُ لَجَعَلَكُمۡ أُمَّةٗ وَٰحِدَةٗ وَلَٰكِن لِّيَبۡلُوَكُمۡ فِي مَآ ءَاتَىٰكُمۡۖ فَٱسۡتَبِقُواْ ٱلۡخَيۡرَٰتِ﴾[1] بۆ هەر کۆمەڵێك لە ئێوە ڕێوشوێنێکمان داناوە، ئەگەر خودا ویستی لێ بوایە دەیکردنە یەك ئوممەت، بەڵام ویستی خوا وابوو لەو شتانەی پێیداون تاقیتان بکاتەوە، دەسا ئێوەش لە کاری چاك پێکەوە پێشبڕکێ بکەن. لێرەشدا ئەفەرموێت: ﴿ يَٰٓأَيُّهَا ٱلَّذِينَ ءَامَنُواْ كُتِبَ عَلَيۡكُمُ ٱلصِّيَامُ كَمَا كُتِبَ عَلَى ٱلَّذِينَ مِن قَبۡلِكُمۡ لَعَلَّكُمۡ تَتَّقُونَ﴾ ئەی کۆمەڵی خاوەن باوەڕان لەسەرتان نووسراوە: ڕۆژو بگرن هەروەك لەسەر پێشوەکانیشتان نووسرابوو بەڵکو لە خودا بترسن. چونکە ڕۆژو پاکو خاوێنی لاشەیەو تەنگکردنەوەی ڕێگاکانی شەیتانە. بۆیە لە هەردوو سەحیحەکەدا هاتووە: (ئەی کۆمەڵی لاوان! هەر کەس لە ئێوە توانای ژن هێنانی هەیە، با ژن بێنێ، چونکە ژن هێنان باشترین هۆکارە بۆ چاو پارێزی و داوێن پارێزی، هەر کەسێکیش ناتوانێ باڕۆژو بگرێت، چونکە بۆی دەبێتە قەڵغان)[2]، پاشان ئەندازەکەی ڕۆژوی ڕوون کردۆتەوە کە چەند ڕۆژێکی دیاری کراوە، بۆئەوەی لەسەر خەڵکی گران نەبێ و نەتوانێ جێبەجێی بکات و لاواز ببێ. بوخاری و موسلم لە عائیشەوە ڕیوایەتیان کردوە(ڕەزای خوای لێ بێ) کە وتویەتی: لە عاشورادا ڕۆژو دەگیرا، کە ڕۆژووی مانگی ڕەمەزان فەرز کرا، ئەو کاتە هەرکەسە ئارەزووی خۆی بووە ڕۆژوو بگرێ یان بیشکێنێ[3]. بوخاریش ڕیوایەتی کردوە لە ئیبنوعومەرەوەو ئیبنومەسعودەوە هەر بەو

---

[1] المائدة(٤٨).

[2] فتح الباري(٩/٨)، مسلم(٢/١٠١٨).

[3] فتح الباري(٨/٢٦)، مسلم(٢/٧٩٢).

جۆره[1]. پاشان خودای مەزن ئەفەرموێت: ﴿ أَيَّامًا مَّعۡدُودَٰتٖۚ فَمَن كَانَ مِنكُم مَّرِيضًا أَوۡ عَلَىٰ سَفَرٖ فَعِدَّةٞ مِّنۡ أَيَّامٍ أُخَرَۚ وَعَلَى ٱلَّذِينَ يُطِيقُونَهُۥ فِدۡيَةٞ طَعَامُ مِسۡكِينٖۖ ﴾ چەند ڕۆژێکی دیاری کراوه، هەر کەسێ له ئێوه نەخۆش بوو یان ڕێبواره، ئەوه پێویسته ئەو ڕۆژوه له ڕۆژانی تراو بگرێتەوه، ئەو کەسانەش کەزۆر به سەختی ڕۆژوویان پێ دەگیرێ، له جێی ڕۆژو لەسەریانه خۆراکی هەژارێك(فیدیه) بدەن. وەك مەعاز(ڕەزای خوای لێ بێ) دەڵێت: لەسەرەتادا هەر کەس ویستبێتی ڕۆژووی گرتووه، هەر کەسیش ویستبێتی شکاندویەتی، بۆ هەر ڕۆژێ خواردنی هەژارێکی داوه، بوخاری ڕیوایەتی کردوه له سەلەمەی کوڕی ئەکوعەوه دەڵێت: کاتێ ئەم ئایەته هاته خوارەوه ﴿وَعَلَى ٱلَّذِينَ يُطِيقُونَهُۥ فِدۡيَةٞ طَعَامُ مِسۡكِينٖۖ﴾ ئەو کەسانەش وا به سەختی ڕۆژوویان پێ دەگیرێ.لەبەرنەخۆشیی یان سەفەرکردن، له جێی ڕۆژوو لەسەرتانه خۆراکی هەژارێك(فیدیه)یان بدەن.

ئەوسا هەرکەسێ ڕۆژوی بشکاندایه، فیدیەی ئەدا هەتا ئەم ئایەتەی دوایی هاته خوارەوەو نەسخی کردەوه[2]. دیسان ڕیوایەتیش کراوه له فەرموودەکەی عەبدوڵلاوه له نافیعەوه له ئیبنوعومەرەوه دەڵێت: ئەوه نەسخ بووەوه[3]، سودی دەڵێت: لەمووڕەوه له عەبدوڵلاوه دەڵێت: ئەم ئایەته: ﴿وَعَلَى ٱلَّذِينَ يُطِيقُونَهُۥ فِدۡيَةٞ طَعَامُ مِسۡكِينٖۖ﴾ ئەو کەسانەی زۆر به سەختی ڕۆژوویان پێ دەگیرێ، له جێی ڕۆژوو لەسەریانه خۆراکی هەژارێك بدەن دەڵێت: خودای گەورەی ئەفەرموێت: ﴿وَعَلَى ٱلَّذِينَ يُطِيقُونَهُۥ﴾ واته: لەسەر ئەوانەی که زۆر به سەختی دەیگرن. عەبدوڵلا دەڵێت: هەر کەسێ ویستبێتی ڕۆژی گرتووەو هەر کەسیش نەی ویستبێ شکاندویەتیو خواردنی هەژارێکی داوه[4]، ﴿فَمَن تَطَوَّعَ﴾ هەرکەسێ ویستی خۆراکی زۆرتر ببەخشێ. واته: خواردنی هەژارێکی تر بدات ﴿خَيۡرٗا فَهُوَ خَيۡرٞ لَّهُۥۚ وَأَن تَصُومُواْ خَيۡرٞ لَّكُمۡ إِن كُنتُمۡ تَعۡلَمُونَ﴾ بۆی باشتره، گەر ئێوه بتانزانیایه به ڕۆژوبوون بۆ ئێوه زۆر چاکتره. ئەوان بەو جۆره بوون هەتا ئەم دەقه نەسخی کردۆتەوه که خودای گەوره ئەفەرموێت: ﴿فَمَن شَهِدَ مِنكُمُ ٱلشَّهۡرَ فَلۡيَصُمۡهُۖ﴾ جا هەرکەسێ مانگی ڕەمەزانی بینی لەسەریەتی بەڕۆژوو بێ.

---

[1] فتح الباري(٨/٢٦).
[2] فتح الباري(٨/٢٩).
[3] فتح الباري(٨/٢٩).
[4] فتح الباري(٨/٢٨).

**فیدیەی ڕۆژوو بۆ پەککەوتە و بەساڵاچوو**

بوخاری لەعەتاوە، بیستویەتی لە ئیبنوعەبباس: ڕیوایەتی کردوە ڕیوایەتی کردوە کە ﴿وَعَلَى الَّذِينَ يُطِيقُونَهُ فِدْيَةٌ طَعَامُ مِسْكِينٍ﴾ دەخوێندەوە، دەڵێت: ئەم ئایەتە نەسخ نەبووەتەوە، مەبەست پێی پیاوی بەساڵاچوو ژنی بەساڵاچووە. کە ناتوانن ڕۆژوو بگرن. بۆ هەر ڕۆژێ خواردن بە هەژارێ بدەن[1] چەندین کەسیش ڕیوایەتیان کردوە لە .سەعیدی کوڕی جوبەیر لە ئیبنوعەبباسەوە هەربەو شێوەیە. پوختەکەی ئەوەیکە نەسخ بوەتەوە، دەربارەی لەش ساغی نیشتەجێ،دەبێ ڕۆژوو بگرێتو فەرزە لەسەری. بەم دەقە لە خودای مەزن ئەفەرموێت: ﴿فَمَن شَهِدَ مِنكُمُ الشَّهْرَ فَلْيَصُمْهُ﴾ جا هەرکەسێ مانگی ڕەمەزانی بینی لەسەریەتی بەڕۆژوو بێ. بەڵام پیاوی بە تەمەنو بەساڵاچوو کە ناتوانێ ڕۆژوو بگرێت، بۆی هەیە نەیگرێتو قەزایشی لەسەر نیە، چونکە بەرەو حاڵێ ناچێ کە ڕۆژوەکەی تیا بگرێتەوە، بەڵکو(فیدیە)ی لەسەرە بۆ هەموو ڕۆژێك، وەك ئیبنوعەبباسو کەسانی تریش لە زانایانی پێشین ڕوونیان کردۆتەوە لەسەر خوێندنەوەی ئەو کەسانە کە خوێندوویانەتەوە ﴿وَعَلَى الَّذِينَ يُطِيقُونَهُ﴾ واتە: ئەوانەی زۆر بە سەختی ڕۆژوویان پێدەگیرێو ناتوانن ڕۆژووبگرن[2]. وەك ئیبنومەسعودو کەسانی تریش وتویانە. ئەمە قسەی بوخاریشە کە دەڵێت: پیری بەساڵاچوو ئەگەر توانای ڕۆژوو گرتنی نەبوو، خۆ ئەنەس کە بەساڵاچوو، ساڵێ تا دوو ساڵ بۆ هەر ڕۆژێ خواردنی هەژارێکی ئەدا، نان بوبێ یان گۆشت، دەیشکاندو بە ڕۆژو نەدەبوو.[3] ئەمەی کە بوخاری باسی کردوە، حافیز ئەبویەعلای موسڵی پشتی پێ بەستووە لە موسنەدەکەیدا لە ئەیوبی کوڕی ئەبوتەمیمەوە دەڵێت: ئەنەس توانای ڕۆژوو گرتنی نەما، لە دەفرێکا تریتی دروست دەکردو سێ هەژاری بانگ دەکردو خواردنی پێ ئەدان[4] ئەمە ژنی سکپڕو شیردەریش دەگرێتەوە ئەگەر ترسیان لە خۆیانو منداڵەکەیان هەبوو تەنیا فیدیەکەی ئیتر ئەدەن قەزایان لەسەر نیە.

﴿شَهْرُ رَمَضَانَ الَّذِي أُنزِلَ فِيهِ الْقُرْآنُ هُدًى لِّلنَّاسِ وَبَيِّنَاتٍ مِّنَ الْهُدَىٰ وَالْفُرْقَانِ ۚ فَمَن شَهِدَ مِنكُمُ الشَّهْرَ فَلْيَصُمْهُ ۖ وَمَن كَانَ مَرِيضًا أَوْ عَلَىٰ سَفَرٍ فَعِدَّةٌ مِّنْ أَيَّامٍ أُخَرَ ۗ يُرِيدُ اللَّهُ بِكُمُ الْيُسْرَ وَلَا يُرِيدُ بِكُمُ الْعُسْرَ وَلِتُكْمِلُوا الْعِدَّةَ وَلِتُكَبِّرُوا اللَّهَ عَلَىٰ مَا هَدَاكُمْ وَلَعَلَّكُمْ تَشْكُرُونَ ﴿١٨٥﴾﴾

---

[1] فتح الباري(٨/٢١٨).

[2] الطبري(٣/٤٣١).

[3] فتح الباري(٨/١٧٩).

[4] مسند أبي يعلى(٧/٢٠٤).

## ڕێزی ڕەمەزان و هاتنە خوارەوەی قورئان تێیدا

خودای مەزن وەسفی مانگی ڕەمەزان دەکات لە نێوان مانگەکانی تردا، کە هەڵیبژاردوەو قورئانی تێدا ناردۆتە خوارەوە فەرموودەیش هاتووە کە کتێبەکانی تریش هەر لەم مانگەدا هاتوونەتەخوارەوە بۆ پێغەمبەرەکانیان(سەلامی خوایان لێ بێ) ئیمامی ئەحمەد لە واسلەوە ڕیوایەتی کردووە کەئیبنوئەسقەع دەڵێت: پێغەمبەری خودا(ﷺ) فەرموویەتی: (پەیامی(صحف)ی ئیبراهیم، لەیەکەم شەوی ڕەمەزاندا هاتۆتە خوارەوە( تەورات) هاتە خوارەوە شەش ڕۆژ لە ڕەمەزان تێپەڕیبوو. ئینجیل یش هاتە خوارەوە سیانزە ڕۆژ لە ڕەمەزان ڕۆشتبوو، کە خودای مەزن کەقورئانی ناردە خوارەوە، بیست و چوار ڕۆژ لە مانگی ڕەمەزان ڕۆشتبوو)[1].

## گەورەیی قورئانی پیرۆز

﴿شَهْرُ رَمَضَانَ ٱلَّذِیٓ أُنزِلَ فِیهِ ٱلْقُرْءَانُ هُدًى لِّلنَّاسِ وَبَیِّنَٰتٍ مِّنَ ٱلْهُدَىٰ وَٱلْفُرْقَانِ﴾ مانگی ڕەمەزان مانگێکە قورئان لەودا هاتۆتە خوارەوە کە ڕێی بە مەردم نیشان ئەداو زۆر نیشانەی شارەزایی و هۆی لە یەکتر هەڵبژاردنی پاک و ناپاکی تێدایە. ئەمە ستایش کردنی قورئانی پیرۆزە کەخودا ڕەوانەی کردوە دڵی بەندەکانی پێ شارەزا دەکات کە بڕوایان پێهێناوە و بەڕاستیان زانیوەو شوێنی کەوتوون، ﴿وَبَیِّنَٰتٍ﴾ نیشانەو بەڵگەی ئاشکرای تێدایە بۆ کەسێ لێی ورد ببێتەوەو لێی تێبگا. بەڵگەیە لەسەر ڕاستی ئەو پەیامەیکە پێی هاتووە ڕێنیشاندەرەو دژی گومڕایی و سەرلێشێواویە، جیاکەرەوەی هەقە لە ناهەقی و حەلاڵ لە حەرام..خوای گەورەبەم تایبەتمەندیانە، ستایشی قورئان دەکات....

## (واجب) بوونی ڕۆژووی مانگی ڕەمەزان

﴿فَمَن شَهِدَ مِنكُمُ ٱلشَّهْرَ فَلْیَصُمْهُ﴾ هەرکەسێ مانگی ڕەمەزان دەبینێ لەسەریەتی بە ڕۆژوو بێ. واتە: کاتێ لە زێدی خۆیدا نیشتەجێ بێ کە مانگی ڕەمەزان دێت، لەشساغ بێ دەبێ ڕۆژوو بگرێت، ئەو ئایەتەی پێشەوە(نەسخ) بووەوە کەڕێی دابوویەو کەسانەی کە نیشتەجێ و لەشساغ بوون(فیدیە) بدەن لە بری هەر ڕۆژێك کە نایگرن خواردن بدەن بە هەژارێك. وەك لە پێشەوە باسمان کرد. دوای ئەوە کە ڕۆژو(واجب) بوو، ئەو مۆڵەتە درایەوە بە نەخۆش و ڕێبوار کە ڕۆژوو نەگرن بەومەرجەکە پاشان کەوتنەوەسەرباری ئاسایی واتە چاکبوونەوە یان دوای سەفەرەکەیان ڕۆژووکە بگرنەوە. وەك ئەفەرمووێت: ﴿وَمَن كَانَ مَرِیضًا أَوْ عَلَىٰ سَفَرٍ فَعِدَّةٌ مِّنْ أَیَّامٍ أُخَرَ﴾ هەرکەسێکیش نەخۆشە یان

---

[1] أحمد(٤/١٠٧)، ئەم فەرمودە هەتنەکەی غەریبە ناگاتە پلەی حەسەن.

ڕێبوارە، ئەو ڕۆژانە لە ڕۆژانیتر بگرێتەوە. واتە: هەرکەسێ نەخۆش بوونەخۆشیەك کە ڕۆژووی بۆ نەگیرا ئازاری ئەدا یان ڕێبوار بوو، بۆی هەیە ڕۆژو وبشکێنێ،بەلأم ئەگەر ڕۆژوی شکاند، لەسەریەتی ئەو ڕۆژە بگرێتەوە دوای چاکبونەوە یان گەڕانەوەلەسەفەرەکەیان لە ڕۆژانی تردا.ئەمەش لەبەرئەوەی: ﴿يُرِيدُ ٱللَّهُ بِكُمُ ٱلۡيُسۡرَ وَلَا يُرِيدُ بِكُمُ ٱلۡعُسۡرَ﴾ خودا سانایی ئێوەی دەوێ‌و نایەوێ ئەرکتان گران بێ. واتە: بۆیە ڕێی داوە بە ئێوە ڕۆژوو بشکێنن لە کاتی نەخۆشی‌و سەفەردابەلأم، فەرزی کردوە لەسەر ئەوانەی نیشتەجی‌و لەش ساغن، لەبەر ئاسانکاری‌و نواندنی بەزەیی بەرانبەرتان.

**چەند مەسەلەیەك دەربارەی ڕۆژوو لە سەفەردا**

لە هەردوو سەحیحەکەدا هاتووە کە پێغەمبەری خودا(ﷺ) لە مانگی ڕەمەزاندا دەرچووە بۆ(فەتح) مەککە، هەتا گەیشتۆتە(کەدید)، پاشان شکاندوویەتی‌و فەرمانیداوە بە خەڵکیش ڕۆژوەکەیان بشکێنن[1]، ئەو فەرماندانە بە پێی ئارەزوو بووە، فەرز نەبووە،واتەسەرپشك.بوون چونکە ئەوان لەگەڵ پێغەمبەری خوادا(ﷺ) لە ڕەمەزاندا دەردەچوون، دەڵێت: هەمانبوو بە ڕۆژوو دەبوو هەشمانبوو دەیشکاند. ئەوەی ڕۆژووی دەگرت ڕەخنەی لەوی تر نەدەگرت‌و ئەویش دەیشکاند ڕەخنەی لەوی تر نەدەگرت. خۆ ئەگەر ڕۆژو نەگرتن(واجب) بوایە، نەدەبوو ڕۆژوو بگرن، بەلأم ئەوەی هاتووە لە کرداری پێغەمبەری خوادا(ﷺ) ئەوەبوو لەو کاتانەدا بە ڕۆژوو بووە. وەك لە هەردوو سەحیحەکەدا هاتوە لە ئەبودەردائەوە کەدەڵێت: لە مانگی ڕەمەزاندا لەگەڵ پێغەمبەری خودا(ﷺ) دەرچووین کە زۆر گەرم بوو، هەتا کەسی وەهامان هەبوو دەستی دەگرت بەسەریەوە لەبەر تینی گەرما، کەسمان بەڕۆژوو نەبووین،جگە لە پێغەمبەری خوداو(ﷺ) عەبدوڵلای کوڕی ڕواحەڕۆژوو[2] شکاندن لە سەفەردا چاکترە،بۆئەوەی ئەو ئاسانکاریە لە دەست نەدرێ، کاتێ پرسیار کرا لە پێغەمبەری خودا(ﷺ) دەربارەی ڕۆژوو گرتن لە سەفەردا فەرمووی: (کەسێ شکاندی چاکە کەسێکیش ڕۆژوی گرت هیچ گوناهی لەسەر نیە)[3]، لە فەرموودەیەکی ترا فەرموویەتی: (ئەو ئاسانکاریانە بگرنەبەرکەپێتان دراون)[4].

هەندێ دەڵێن: گرتنی ڕۆژوو یان شکاندنی وەك یەکە. بەپێی ئەم فەرموودەیەی عائیشە کە حەمزەی کوڕی عەمری ئەسلەمی دەڵێت: ئەی پێغەمبەری خودا(ﷺ) من زۆر ڕۆژو دەگرم، ئایا لە سەفەردا ڕۆژوو بگرم؟ فەرمووی: (ئەگەر ویستت ڕۆژوو بگرەو ئەگەر ویستیشت بیشکێنە)، ئەم فەرموودەیەلە

---

[1] فتح الباري(٣/٢١٣)، مسلم(٢/٧٨٤).
[2] فتح الباري(٤/٢١٥)، مسلم(٢/٧٩٠).
[3] مسلم(٢/٧٩٠).
[4] مسلم(٢/٧٨٦).

هەردوو سەحیحەکەدا هاتووە[1]. وتراوە: ئەگەر ڕۆژوو گرتنەکە زۆر گران بوو ئەوا شکاندنی چاکترە. بەپێی ئەم فەرمودەیەی جابیر کە پێغەمبەری خودا(ﷺ) پیاوێکی بینی سێبەریان لە سەر کردبوو، فەرمووی: ئەوە چیەتی؟ وتیان: بەڕۆژوە. فەرمووی: (ڕۆژو گرتن لە سەفەردا لە کارە چاکەکان نیە)، لە هەردوو سەحیحەکەدا هاتووە،[2] بەڵام کەسێ لە سوننەت لایداو وایدەزانی ڕۆژوو شکاندن باش نیە بۆی واتە(مکروهه) ئەوە پێویستە ڕۆژووەکەی بشکێنێو ڕۆژوو گرتنی لێ قەدەغە دەکرێت، بۆ ڕۆژوو گرتنەوەش پێویست نیە ڕۆژەکان بەدوای یەکدا بێ، بە ئارەزوی ئەو کەسە خۆیەتی، دەتوانێ بە جیا جیا بیگرێت،دەشتوانێ بەدوای یەکدا ڕۆژووەکە بگرێتەوە. چونکە ڕۆژو گرتن بەدوای یەکدا لە مانگی ڕەمەزاندا فەرزە لەبەر پێویستی بەجێ هێنان لەو مانگەدا. بەڵام دوای مانگی ڕەمەزان مەبەست گرتنەوەی ئەو ڕۆژانەیە کە شکاندویەتی ئەو کەسە ئارەزوی خۆیەتی بەسەر یەکەوە دەیانگرێتەوە یان جیا جیا وەك لە فەرمودەدا هاتوە. هەر بۆیە خودای مەزن ئەفەرموێت: ﴿فَعِدَّةٌ مِّنْ أَيَّامٍ أُخَرَ﴾ ئەو ژمارەیە لە ڕۆژانی دیکە دەگرێتەوە.

**ئاسانکاریی نەك سەختگیری**

پاشان خودای مەزن ئەفەرموێت: ﴿يُرِيدُ اللَّهُ بِكُمُ الْيُسْرَ وَلَا يُرِيدُ بِكُمُ الْعُسْرَ﴾ خودا ئاسانکاری بۆئێوە دەوێ، نایەوێت ئەرکتان گرانبێ. ئیمامی ئەحمەد لە ئەنەسی کوڕی مالیکەوە ڕیوایەتی کردوە کە پێغەمبەری خودا(ﷺ) فەرمویەتی: (ئاسانکاریی بکەن، شت گران مەکەن، دڵنەوایی دەرخەن و خەڵك دوور مەخەنەوە)[3]. کە پێغەمبەری خودا(ﷺ) فەرمووی: بە مەعازو ئەبوموسا کاتێ کە ڕەوانەی کردن بۆ یەمەن: (مژدەدەربن،خەڵك مەتارێنن،دور مەخەنەوە شت ئاسان بکەن و قورسی مەکەن،گوێڕایەڵی یەکتر بن و دژایەتی یەکتر مەکەن)[4]، ئەفەرموێت: ﴿يُرِيدُ اللَّهُ بِكُمُ الْيُسْرَ وَلَا يُرِيدُ بِكُمُ الْعُسْرَ﴾ خودا سانایی ئێوەی دەوێ، نایەوێ ئەرکتان گران بێ. واتە: بۆیە ڕێی پێداون کە نەخۆش و ڕێبوار ڕۆژوو بشکێنن،دەیەوێ ئاسانکاریتان بۆ بکات و. هەتا لە کاتێکی ترا ئەو ڕۆژانەی کە نەگیراوە لە ڕۆژانێکی تردا بە تەواوی بیگرنەوە.

---

[1] فتح الباري(٤/٢١١)، مسلم(٢/٧٨٩).

[2] فتح الباري(٤/٢١٦)، مسلم(٢/٧٨٦).

[3] لە هەردوو سەحیحەکەدا هاتووە وە دیسان لە هەردوو سەحیحەکەدا هاتووە

[4] فتح الباري(٧/٦٦٠)، مسلم(٣/١٥٨٧).

## یادکردنی خودادوای پەرستشەکان

﴿وَلِتُكَبِّرُوا۟ ٱللَّهَ عَلَىٰ مَا هَدَىٰكُمْ﴾ یادی خودا بکەنەوە ئەو ڕێگەی نیشان داون. واتە: لە کاتی تەواو کردنی خوا پەرستیتان کرد یادی خودای مەزن بکەن، وەك لە ئایەتی تریشدا ئەفەرموێت: ﴿فَإِذَا قَضَيْتُم مَّنَـٰسِكَكُمْ فَٱذْكُرُوا۟ ٱللَّهَ كَذِكْرِكُمْ ءَابَآءَكُمْ أَوْ أَشَدَّ ذِكْرًا﴾[1] هەر کاتێ ئێوە ڕێو شوێنی پێویستتان بەجێهێنا، وەك یادی بابو باپیری خۆتان دەکەن هەر ئاواو لەوە زیاتریش یادی خودا بکەنەوە. یان ئەفەرموێت: ﴿فَإِذَا قُضِيَتِ ٱلصَّلَوٰةُ فَٱنتَشِرُوا۟ فِى ٱلْأَرْضِ وَٱبْتَغُوا۟ مِن فَضْلِ ٱللَّهِ وَٱذْكُرُوا۟ ٱللَّهَ كَثِيرًا لَّعَلَّكُمْ تُفْلِحُونَ﴾[2] هەر کاتێ لە نوێژ بونەوە، بە زەویدا بلاو ببنەوەو بۆ چاکەی خودا تێبکۆشنو زۆر یادی خودا بکەن، بەڵکو ڕزگارتان ببێ.هەروەها وە ئەفەرموێت: ﴿وَسَبِّحْ بِحَمْدِ رَبِّكَ قَبْلَ طُلُوعِ ٱلشَّمْسِ وَقَبْلَ ٱلْغُرُوبِ ﴿٣٩﴾ وَمِنَ ٱلَّيْلِ فَسَبِّحْهُ وَأَدْبَـٰرَ ٱلسُّجُودِ﴾[3] هەر پەسندی پاکی پەروەندەی خۆت بدە، لە پێش گزنگی هەتاو داو بەر لە دەمی ڕۆژ ئاوا بوون. هەر بۆیە فەرموودە هاتووە کە سوننەتە(سبحان الله، والحمد لله والله أكبر) بکرێ دوای نوێژە فەرزەکان. ئیبنو عەبباس دەڵێت: ئێمە کۆتایی نوێژی پێغەمبەری خودامان(ﷺ) نەدەزانی مەگین بە(الله أكبر)[4] واتە: وتنی(الله أكبر) دەمانزانی کۆتایی بەنوێژ هێناوە. هەر بۆیە زۆرێك لە زانایان(الله أكبر)یان بەڕوا داناوە لە جەژنی قوربانداا، بەپێی ئەم ئایەتە کە خودای مەزن ئەفەرموێت: ﴿وَلِتُكْمِلُوا۟ ٱلْعِدَّةَ وَلِتُكَبِّرُوا۟ ٱللَّهَ عَلَىٰ مَا هَدَىٰكُمْ وَلَعَلَّكُمْ تَشْكُرُونَ﴾ دەیەوێ بە ئاسانی ڕۆژووی ئەو ماوە تەواو بکەنو یادی خودا بکەنەوە، کە ئەو ڕێگەی نیشان داونو پێویستە ستایشی بکەن. واتە: کاتێ پێڕەوی فەرمانی خواتان کرد بەوەی فەرمانی پێداون لە پەرستش وبەجێهێنانی فەرزەکانو واز هێنان لە قەدەغە کراوەکانو پاراستنی سنوورەکانی، بەڵکوبتوانن سوپاسو ستایشی بەو جۆرەبکەن کە خودا پێی ڕازیە.

﴿وَإِذَا سَأَلَكَ عِبَادِى عَنِّى فَإِنِّى قَرِيبٌ ۖ أُجِيبُ دَعْوَةَ ٱلدَّاعِ إِذَا دَعَانِ ۖ فَلْيَسْتَجِيبُوا۟ لِى وَلْيُؤْمِنُوا۟ بِى لَعَلَّهُمْ يَرْشُدُونَ ﴿١٨٦﴾﴾

---

[1] البقرة(٢٠٠).

[2] الجمعة(١٠).

[3] ق(٣٩-٤٠).

[4] البخاري(٨٤٨).

﴿ وَإِذَا سَأَلَكَ عِبَادِي عَنِّي فَإِنِّي قَرِيبٌ أُجِيبُ دَعْوَةَ الدَّاعِ إِذَا دَعَانِ فَلْيَسْتَجِيبُوا لِي وَلْيُؤْمِنُوا بِي لَعَلَّهُمْ يَرْشُدُونَ ﴾ هەر کاتێ عەبدەکانی من لەسەر تۆ لە من دەپرسن، من نزیکم، هەر کەسێ هانام وەبەر بهێنێ، بێ وەڵامی ناهێڵمەوە. با ئەوانیش لە فەرمانی من دەرنەچن،. بڕوای تەواویان بە من بێ، بەڵکو ڕێی ڕاست بدۆزنەوە.

## خودا پاڕانەوەی بەندەکانی دەبیستێ

ئیمامی ئەحمەد لە ئەبوموسای ئەشعەریەوە ڕیوایەتی کردوە،: لە غەزایەکدا لە خزمەت پێغەمبەری خودا بووین(ﷺ)کەسەردەکەوتینەسەرهەرپەرزاییەک،یانکەبەرەوشێوێك دادەبەزین دەبووبەدەنگی بەرز،(الله أكبر) دەڵێت: پێغەمبەر لێمان نزیك بوەوەو فەرمووی: (خەڵکینە! هێواش لەسەر خۆتان، چونکە ئێوە هاوار لە کەڕو لە شتێکی دوور ناکەن، بەڵکو هاوار لە زاتێکی بیسەرو بینەر دەکەن، ئەو زاتەی هاواری لێدەکەن لە ملی وڵاغی هەر کام لە ئێوە، نزیکترە لێتانەوە. ئەی عەبدوڵڵای کوڕی قەیس ئایا وتەیەکت فێر بکەم لە گەنجینەکانی بەهەشت؟ لاحول ولاقوة إلابالله)[1]. لەهەردووسەحیحەکەدا هاتووە[2]. زانایانی تری فەرموودەیش هەروا هێناویانە، ئیمامی ئەحمەد لە ئەنەسەوە ڕیوایەتی کردوە(ڕەزای خوای لێ بێ) کە پێغەمبەر(ﷺ) فەرمووی: (خودای مەزن ئەفەرموێت من لەگەڵ گومان بەندەی خۆمم پێم، من لەگەڵیدام کاتێ هاواری لێکردم)[3].

## پاڕانەوە لە خودا وەردەگیرێ و بە زایە ناچێ

ئیمامی ئەحمەدڕیوایەتی کردوە لە ئەبوسەعیدەوە کە پێغەمبەری خودا(ﷺ) فەرموویەتی: (هیچ موسوڵمانێ نیە لە خوای مەزن بپاڕێتەوە پاڕانەوەیەك کە گوناه نەبێ و پەیوەندی خزمایەتیش نە پچڕێنێ، بادڵنیابێ خودا یەکێ لەم سێ شتەی پێ دەبەخشێ، یان پاڕانەوەکەی بەخێرا یی بۆ بەجێ دێنێ، یان بۆی هەڵدەگرێ بۆ ڕۆژی دوایی، یان لە خراپەیەك بە ئەندازەی ئەوە لایدەدات)، وتیان: کە وایە زیادی کەین؟ فەرمووی: (خودایش زیاترتان لەگەڵدا دەکا)[4]، عەبدوڵڵای کوڕی ئیمامی ئەحمەد ڕیوایەتی کردوە لە جوبەیری کوڕی نوفەیرەوە: کە عوبادەی کوڕی سامیت بۆی گێڕاونەتەوە کە پێغەمبەر(ﷺ) فەرموویەتی: (هیچ موسوڵمانێ نیە لەسەر پشتی ئەم زەمینەدا بپاڕێتەوە لە خودای مەزن بە نزایەك خودا ئەو پاڕانەوە یەی وەرگرتوە، یان بە ئەندازەی ئەوە خراپەی لێلا ئەدات، ئەگەر

---

[1] أحمد(٤/٤٠٢)، سەحیحە.

[2] فتح الباري(٢/٥٠٩)، مسلم(٤/٢٠٧٦).

[3] أحمد(٣/٢١٠)، سەحیحە.

[4] أحمد(٣/١٨)، حەسەنە.

پاڕانەوەکەی بۆ تاوانێ یان بڕینی پەیوەندی خزمایەتی نەکردبێ)[1] ئیمامی مالیك ڕیوایەتی کردوە لە ئەبوهورەیرەوە: کە پێغەمبەری خودا(ﷺ) فەرموویەتی: ((پاڕانەوە) لەهەر یەکێ وەردەگیرێ ئەگەر پەلە نەکاتو بڵێ پاڕامەوەو لێم وەرنەگیرا)[2] لە هەردوو سەحیحەکەدا هاتووە لە فەرموودەکەی مالیکەوە[3] موسلیم ڕیوایەتی کردوە لە ئەبوهورەیرەوە لە پێغەمبەری خوداوە(ﷺ) کە فەرموویەتی: (بەردەوام دوعای بەندە وەردەگیرێ، ئەگەر دوعا نەکا بۆ گوناهێ یان بڕینی پەیوەندی خزمایەتیو پەلەیش نەکات) وترا: پەلە کردن چۆنە؟ فەرمووی: (دەڵێ: پاڕامەوە، پاڕامەوە، لێم وەرنەگیرا. لەو کاتەدا ئاخ هەڵدەکێشێو واز لە پاڕانەوە دێنێ)[4].

### سێ کەس دوعایان ناگەڕێتەوە

لە موسنەدی ئیمامی ئەحمەد و سونەنی تیرمیزی و نەسائی و ئیبنوماجەدا هاتووە لە ئەبوهورەیرەوە دەڵێت: پێغەمبەری خودا(ﷺ) فەرموویەتی: (سێ کەس دوعایان ناگەڕێتەوە: پێشەوایەکی دادپەروەر، ڕۆژووەوانێك کاتێ ڕۆژوو دەشکێنێ،هەروەها دوعای ستەملێکراو خودای مەزن بەرزی دەکاتەوە لە بەری ئەو هەورەدا(الضمام)[5] لە ڕۆژی قیامەتدا دەرگاکانی ئاسمانی بۆ دەکرێتەوە، ئەفەرموێت: سوێند بە شکۆمەندی خۆم، یارمەتیت ئەدەم با دوای ماوەیەکیش بێت)[6].

﴿أُحِلَّ لَكُمْ لَيْلَةَ الصِّيَامِ الرَّفَثُ إِلَىٰ نِسَائِكُمْ ۚ هُنَّ لِبَاسٌ لَّكُمْ وَأَنتُمْ لِبَاسٌ لَّهُنَّ ۗ عَلِمَ اللَّهُ أَنَّكُمْ كُنتُمْ تَخْتَانُونَ أَنفُسَكُمْ فَتَابَ عَلَيْكُمْ وَعَفَا عَنكُمْ ۖ فَالْآنَ بَاشِرُوهُنَّ وَابْتَغُوا مَا كَتَبَ اللَّهُ لَكُمْ ۚ وَكُلُوا وَاشْرَبُوا حَتَّىٰ يَتَبَيَّنَ لَكُمُ الْخَيْطُ الْأَبْيَضُ مِنَ الْخَيْطِ الْأَسْوَدِ مِنَ الْفَجْرِ ۖ ثُمَّ أَتِمُّوا الصِّيَامَ إِلَى اللَّيْلِ ۚ وَلَا تُبَاشِرُوهُنَّ وَأَنتُمْ عَاكِفُونَ فِي الْمَسَاجِدِ ۗ تِلْكَ حُدُودُ اللَّهِ فَلَا تَقْرَبُوهَا ۗ كَذَٰلِكَ يُبَيِّنُ اللَّهُ آيَاتِهِ لِلنَّاسِ لَعَلَّهُمْ يَتَّقُونَ ﴿١٨٧﴾﴾

---

[1] أحمد(٣٢٩/٥)، فەرموودەیەکی حەسەنە. تیرمیزیش ڕیوایەتی کردوە. تحفة الاحوذي(٢٤/١٠)، حەسەنە.

[2] أحمد(٣٩٦/٢)، سەحیحە.

[3] فتح الباري(١٤٥/١١)، مسلم(٢٠٩٥/٤).

[4] مسلم(٢٠٩٦/٤).

[5] مەبەست بەم هەورە(الضمام) ئەم ئایەتە بوو: ﴿وَيَوْمَ تَشَقَّقُ السَّمَاءُ بِالْغَمَامِ﴾(الفرقان: ٢٥)، ئەم ئایەتە ﴿هَلْ يَنظُرُونَ إِلَّا أَن يَأْتِيَهُمُ اللَّهُ فِي ظُلَلٍ مِّنَ الْغَمَامِ﴾(البقرة:٢١٠)،(لە شەرحی سونەنی ئیبنوماجە وەرگیراوە).

[6] أحمد(٥٤٤/٣)، تحفة الاحوذي(٢٢٩/٧)، حەسەنە.

**ئیزندان بە خواردن و خواردنەوەو سەرجێیکردن لە شەوانی ڕەمەزاندا**

﴿أُحِلَّ لَكُمْ لَيْلَةَ ٱلصِّيَامِ ٱلرَّفَثُ إِلَىٰ نِسَآئِكُمْ هُنَّ لِبَاسٌ لَّكُمْ وَأَنتُمْ لِبَاسٌ لَّهُنَّ عَلِمَ ٱللَّهُ أَنَّكُمْ كُنتُمْ تَخْتَانُونَ أَنفُسَكُمْ فَتَابَ عَلَيْكُمْ وَعَفَا عَنكُمْ فَٱلْـَٰٔنَ بَٰشِرُوهُنَّ وَٱبْتَغُوا۟ مَا كَتَبَ ٱللَّهُ لَكُمْ﴾

سەرجێیی ژنان کردنتان، لە شەوانی ڕەمەزاندا بۆتان ڕوایە، ئەوان ئەواڵ پۆشاکی ئێوەن و ئێوەش پۆشاکی ئەوانن، خودا لەوە ئاگادارە لە پێشدا بەرانبەر بە خۆتان ناپاك بوون، بەو پەشیمان بوونەوەتان عەفوی کردن و بەخشیونی،هەر لە ئێستاوە دەتوانن دەستیان لەگەڵ تێکەڵ بکەن و هەرچی خوا لە چارەتانی نوسیووە شوێنی کەون. ئەمە ئاسانکاریەکە خودای مەزن دەربارەی موسوڵمانان کردویەتی. ئەوەی لەسەریان دانرا بوو لە سەرەتای هاتنی ئیسلامدا لەسەری لابردن، ئەگەر یەکێکیان ڕۆژووی بشکاندایە، خواردن و خواردنەوەو سەرجێیی بۆ حەلاڵ بوو هەتا نوێژی عیشا، یان پێش ئەوەی خەوی لێبکەوێ. هەر کاتێ خەوی لێبکەوتایە یان نوێژی عیشای بکردایە خواردن و خواردنەوەو سەرجێیی لێ حەرام دەبوو. هەتا شەوی دوایی، بەمەش تووشی زۆر ناڕەحەتی دەبوون ﴿الرَّفَثُ﴾ مەبەست پێی سەرجێیکردنە. ئیبنوعەبباس و عەتاو موجاهیدو[1] سەعیدی کوڕی جوبەیرو تاوس و سالمی کوڕی عەبدوڵلاو[2] عەمری کوڕی دینارو[3] حەسەن و[4] قەتادەو زوهریو[5] زەحاك و ئیبراهیمی نەخەعی و سوودیو[6] عەتای خۆراسانی و موقاتیلی کوڕی حەیان[7] هەموو وتویانە مەبەست پێی سەرجێییە. پاشان ئەفەرموێت: ﴿هُنَّ لِبَاسٌ لَّكُمْ وَأَنتُمْ لِبَاسٌ لَّهُنَّ﴾ ئەوان بۆ ئێوە پۆشاکن، ئێوەش بۆ ئەوان پۆشاکن. ئیبنوعەبباس و موجاهیدو سەعیدی کوڕی جوبەیرو حەسەن و قەتادەو سوودیو موقاتیلی کوڕی حەیان دەڵێن: ئەوان ئارامین(سَكَنْ) بۆ ئێوە، ئێوەش ئارامین بۆ ئەوان[8] ڕەبیعی کوڕی ئەنەس، دەڵێت: ئەوان لیفەن(بەرگ) بۆ ئێوە، ئێوەش لیفەن بۆ ئەوان[9] کورتەکەی ئەمەیە: پیاوو ژن هەریەکەیان تێکەڵیی ئەوی تر دەکات و لەگەڵی پاڵدەکەوێ و بەریەك دەکەوێت و جێی خۆیەتی کە

---

[1] ابن ابي حاتم غ: (١/٣٦٧٦).
[2] ابن ابي حاتم غ: (١/٣٦٨).
[3] ابن ابي حاتم غ: (١/٣٦٩).
[4] ابن ابي حاتم غ: (١/٣٦٨).
[5] ابن ابي حاتم غ: (١/٣٦٩).
[6] ابن ابي حاتم غ: (١/٣٦٨).
[7] ابن ابي حاتم غ: (١/٣٧٠/١٧١).
[8] ابن ابي حاتم غ: (١/٣٧٠).
[9] ابن ابي حاتم(١/٣٨١).

ڕێیان پێ بدرێت لە شەوی ڕەمەزاندا سەرجێیی بکەن، بۆ ئەوەی لەسەریان گران نەبێو تەنگاو نەبن.
ئەبوئیسحاق گوتی لە بەرائی کوڕی عازبەوە، دەڵێت: هاوەڵەکانی پێغەمبەر(ﷺ) ئەگەر پیاوێ بەڕۆژوو بوایەو خەوی لێبکەوتایە پێش ئەوەی ڕۆژو بشکێنێ نەیدە دەخوارد هەتا ڕۆژێکیتر. قەیسی کوڕشی سیرمەی ئەنساری بەڕۆژوو بوو، ئەو ڕۆژەیش کاری کردبوو لە زەویەکەیدا، کاتێ وەختی شکاندن هات، چووە لای خێزانیو پێی وت: خواردنت لەلایە؟ (ژنەکە) وتی: نەخێر، بەڵام دەچم بۆت پەیدا دەکەم.،ئەم چاوی نیشتو خەوی لێکەوت، خێزانەکەی هات، کە بینی خەوتوە،: نوشوستی بۆ تۆئەوە خەوتی؟ کاتێ ڕۆژ بەرەو ناوەڕاست چوو لە هۆش خۆی چوو، ئەوەیان بۆ پێغەمبەر(ﷺ) باس کرد، ئەم ئایەتە هاتە خوارەوە کە ئەفەرموێت: ﴿أُحِلَّ لَكُمْ لَيْلَةَ ٱلصِّيَامِ ٱلرَّفَثُ إِلَىٰ نِسَآئِكُمْ﴾ هەتا دەگاتە: ﴿وَكُلُوا۟ وَٱشْرَبُوا۟ حَتَّىٰ يَتَبَيَّنَ لَكُمُ ٱلْخَيْطُ ٱلْأَبْيَضُ مِنَ ٱلْخَيْطِ ٱلْأَسْوَدِ مِنَ ٱلْفَجْرِ﴾ زۆر بەم ئایەتە دڵخۆش بوون[1] سەرجێیی ژنان کردنتان لە شەوانی ڕەمەزان بۆتان ڕەوایە. هەتا دەگاتە: بخۆنو بخۆنەوە هەتا ڕوشتەی سپی بۆتان جیادەبێتەوە لە ڕوشتەی ڕەشی شەو لە شەبەقدا بوخاری لێرەدا لە ڕێگەی ئەبوئیسحاقەوە، دەڵێت: لە بەراوم بیست دەیوت کاتێ کە ڕۆژووی ڕەمەزان دابەزی(فەرزکرا) پیاوان نزیکی ژنان نەدەکەتنەوە لە هەموومانگی ڕەمەزاندا، پیاوان بەمە خیانەتیان لە خۆیان کرد،ئەوجا خودای مەزن ئەم دەقەی ناردە خوارەوە: ﴿عَلِمَ ٱللَّهُ أَنَّكُمْ كُنتُمْ تَخْتَانُونَ أَنفُسَكُمْ فَتَابَ عَلَيْكُمْ وَعَفَا عَنكُمْ﴾[2] خودا لەوە ئاگادارە ئێوە لە پێشدا بەرانبەر بە خۆتان ناپاك بوون، بەو پەشیمان بوونەوەتان بەخشینیو عەفوی کردن. عەلی کوڕی ئەبوتەلحە لە ئیبنوعەبباسەوە، دەڵێت: موسوڵمانان لە مانگی ڕەمەزاندا کاتێ نوێژی عیشایان دەکرد، ژنو خواردنیان لێ حەرام کرا بوو، هەتا بەربانگی ڕۆژی دوایی. پاشان هەندێ خەڵکی موسوڵمان ناچاری سەرجێیکردن بوونوخواردنیشیان خوارد لەوکاتەدا، لەوانە عومەری کوڕی خەتاب. سکاڵایان هێنابۆلای پێغەمبەری خودا(ﷺ) خودای مەزن ئەم ئایەتەی ناردە خوارەوە: ﴿عَلِمَ ٱللَّهُ أَنَّكُمْ كُنتُمْ تَخْتَانُونَ أَنفُسَكُمْ فَتَابَ عَلَيْكُمْ وَعَفَا عَنكُمْ فَٱلْـَٔـٰنَ بَـٰشِرُوهُنَّ﴾ هەر بەمجۆرە عەوفی ڕیوایەتی کردوە لە ئیبنوعەبباسەوە[3]، ئەفەرموێت: ﴿وَٱبْتَغُوا۟ مَا

---

[1] الطبري(٣/٤٩٥).

[2] فتح الباري(٨/٣٠).

[3] الطبري(٣/٤٩٦-٤٩٨).

كَتَبَ ٱللَّهُ لَكُمۡ﴾ هەرچی خوا لە چارەتانی نووسیوە شوێنی بکەون.[1] قەتادە دەڵێت: شوێنی ئەو دەرفەتە بکەون کە خودا لەسەری نووسیون. سەعد دەڵێت لە قەتادەوە ﴿وَٱبۡتَغُواْ مَا كَتَبَ ٱللَّهُ لَكُمۡ﴾ دەڵێت: شوێن ئەوە بکەون کە خودا بۆی حەلاڵ کردون.

## دواین کاتی پارشێو

﴿وَكُلُواْ وَٱشۡرَبُواْ حَتَّىٰ يَتَبَيَّنَ لَكُمُ ٱلۡخَيۡطُ ٱلۡأَبۡيَضُ مِنَ ٱلۡخَيۡطِ ٱلۡأَسۡوَدِ مِنَ ٱلۡفَجۡرِۖ ثُمَّ أَتِمُّواْ ٱلصِّيَامَ إِلَى ٱلَّيۡلِ﴾ بخۆن و بخۆنەوە هەتا تاڵی سپی لە تاڵی ڕەش جیادەبێتەوە، پاشان ڕۆژووتان تەواو بکەن هەتا شەو. خودای مەزن ڕێگەی بە خواردن و خواردنەوەو سەرجێییشی داوە وەك لە پێشەوە باسمان کرد لە هەر شەوێکدا ڕۆژووەوان ئارەزووی لێبێ، هتا کاتێ کەسپێدەی بەیانی لە تاریکی شەو دەردەکەوێ، ئەویش تاڵی سپی و تاڵی ڕەشی بۆ بەکارهێنراوە، ئەو گومانە بە وتەی ﴿مِنَ ٱلۡفَجۡرِ﴾ لابراوە. وەك ئەم فەرمودەیەی کە ئیمام ئەبوعەبدوڵلای بوخاری لە سەهلی کوڕی سەعدەوە، ڕیوایەتی کردوە: ئەم ئایەتە هاتە خوارەوە: ﴿وَكُلُواْ وَٱشۡرَبُواْ حَتَّىٰ يَتَبَيَّنَ لَكُمُ ٱلۡخَيۡطُ ٱلۡأَبۡيَضُ مِنَ ٱلۡخَيۡطِ ٱلۡأَسۡوَدِ﴾ بەلام﴿مِنَ ٱلۡفَجۡرِ﴾ی لەگەڵدا نەهاتبوو پیاوی وا هەبوو کە دەیویست بەڕۆژوو بێ پەتێکی سپی و پەتێکی ڕەشی بە قاچیەوە. دەبەست خواردن و خواردنەوەی دەخوارد هەتا بۆی دەردەکەوت کامیان ڕەشەو کامیان سپیە، پاشان خودای مەزن ﴿مِنَ ٱلۡفَجۡرِ﴾ی ناردەخوارەوە. ئەو کاتە زانیان مەبەست پێی شەوو ڕۆژە لە شەعبیەوە لە عەدیەوە[2]، بوخاری ڕیوایەتی کردوە عەدی پەتێکی سپی‌ویەکێکی ڕەشی هەڵگرت،هەندێ لە شەو مابووکە سەیری دەکرد بۆی جیا نەدەکرایەوە،کە ڕۆژ بوەوە دەڵێت: ئەی پێغەمبەری خودا خستمە ژێر سەرینەکەم فەرمووی: (دیارە سەرینەکەت پان بووە، ئەگەر تەڵی سپی و تەڵی ڕەش لە ژێریدا بوبێ)[3]، لە هەندێ وتەدا هاتوە(إنك عريض القفى)[4] هەندێ مانایان بە گێلی لێك داوەتەوە، بەلام ئەم مانایە بەهێو نیە. بەڵکو لەبەر ئەوەیە، هەرکەسێ سەرینەکەی پان بێ شان و ملیشی پانە،( والله أعلم.) ڕیوایەتەکەی بوخاریش دیسان تەفسیری کردوە لە عەدی کورشی حاتەمەوە، دەڵێت وتم: ئەی پێغەمبەری خودا(ﷺ) مەبەست بە تاڵی سپی و تاڵی ڕەش چیە،ئایا ئەو دوو تاڵەیە؟ فەرمووی:

---

[1] ئەبوهورەیرەو ئیبنوعەبباس و ئەنەس و شورەیحی قازی و موجاهیدو عیکرمەو سەعیدی کوڕی جوبەیرو عەتاو ڕەبیعی کوڕی ئەنەس و سوودی و زەیدی کوڕی ئەسلەم و حەکەمی کوڕی عوتبەو موقاتیلی کوڕی حەیان و حەسەنی بەسری و زەحاك و قەتادەو کەسانی تریش وتووص یانە مەبەست پێی کوڕە

[2] فتح الباري(٨/٣١).

[3] فتح الباري(٨/٣١).

[4] فتح الباري(٨/٣١).

(بێگومان تۆ شان و ملت پانە،ئەگەر ئەو تاڵەت چاو پێکەوتبێ. پاشان فەرمووی: نەخێر ئەوە تاریکایی شەوو سپێدەی ڕۆژە)[1].

## سوننەتی پارشێووکاتەکەی

ڕێپێدانی خودای مەزن بە خواردن هتا دەرکەوتنی ڕووناکی، نیشانەیە لەسەر بە سوننەت بوونی پارشێو کردن، چونکە لە بەشی ئاسانکاری و مۆڵەتدانە، پابەند بوون پێیەوە کارێکی چاکە، هەربۆیە لە فەرموودەی(سەحیحدا) هاتووە کە پێغەمبەری خودا(ﷺ) موسوڵمانانی هانی داوە بۆ پارشێو کردن، لە هەردوو سەحیحەکەدا هاتووە لە ئەنەسەوە،کە دەڵێت: پێغەمبەری خودا(ﷺ) فەرموویەتی: (پارشێو بکەن چونکە لە پارشێودا بەرەکەت هەیە)[2]، لە سەحیحی موسلیم یشدا هاتووە لەعەمری کوڕی عاسەوە(ڕەزای خوای لێبێ) دەڵێت: پێغەمبەری خودا(ﷺ) فەرموویەتی: (بێگومان جیاوازی نێوان ڕۆژووی ئێمەو ئەهلی کتێب پارشێوەکردنە)[3] ئیمامی ئەحمەد لە ئەبوسەعیدەوە،ڕیوایەتی کردوەپێغەمبەری خودا(ﷺ) فەرموویەتی: (پارشێو کردن خواردنەکەی بەرەکەتە، وازی لێمەهێنن، با ئەگەر یەکێك لە ئێوەتنها قومێ ئاویش بخواتەوە، بێگومان خوداو فریشتەکانی سڵاوات ئەدەن لەسەرئەوانەی پارشێو دەکەن)[4]، فەرمودەی زۆر هاتووە بۆهاندان لەسەر پارشێو کردن با بە قومێ ئاویش بێ، بۆ ئەوەی لە ڕیزی پارشێو کەران بن. سونەتە دواخستنی پارشێو، هەتا کاتی دەرکەوتنی سپێدەیبەرەبەیان، وەك لە هەردوو سەحیحەکەدا هاتووە لە ئەنەسی کوڕی مالیکەوە، لە زەیدی کوڕی سابتەوە، دەڵێت: پارشێومان لەگەڵ پێغەمبەری خوادا کرد(ﷺ) پاشان هەڵسااین بۆ نوێژ کردن. ئەنەس دەڵێت: وتم بە زەید: نێوان بانگو پارشێو چەندە؟ دەڵێت: پەنجا ئایەتە.[5] لە زۆرێکیش لە زانایانی پێشینەوە ڕیوایەت کراوە، کە ئەوان چاوپۆشیان کردوە لە پارشێو کردن لە نزیکی بەرەبەیاندا، ئەمەیش ڕیوایەت کراوە لە ئەبوبەکرو عومەرو عەلی و ئیبنومەسعودو حوزەیفەو ئەبوهورەیرەو ئیبنوعومەرو ئیبنوعەبباس و زەیدی کوڕی سابت و کۆمەڵێکی زۆریش لە شوێن کەوتوان

---

[1] فتح الباري(٨/٣١).

[2] فتح الباري(٤/١٦٥)، مسلم(٢/٧٧٠).

[3] مسلم(٢/٧٧١).

[4] أحمد(٣/٤٤)، ئەم فەرموودەیە بەڵگەی تر بەهێزی کردوە(والله أعلم).

[5] فتح الباري(٤/١٦٤)، مسلم(٢/٧٧١).

.ڕیوایەتی کردوە لەوانە . سەنەدی ئەمانەمان لە(کتاب الصیام) دا بە تەنیا دەرهێناوە. سوپاس بۆ خودای مەزن. لە هەردوو سەحیحەکەدا لە فەرموودەکەی قاسمدا هاتووە لە عائیشەوە، کە پێغەمبەری خودا(ﷺ) فەرموویەتی: (بانگی بیلال ڕێگریتان لێ نەکا ت لە پارشێو کردن، چون ئەو لە شەودا بانگ ئەدات، بخۆن و بخۆنەوە هەتا بانگی ئوموممەکتوم دەبیسن، چونکە ئەم بانگ نادات هەتا دەرکەوتنی بەرەبەیان)[٢]. ئیمامی ئەحمەد ڕیوایەتی کردوە لە قەیسی کوڕی تەلقەوە(طَلْق) لە باوکیەوە کە پێغەمبەری خودا(ﷺ) فەرموویەتی: (بەرەبەیان(الفجر) ئەوە نیە کە بە کەناری ئاسۆدا سپێتی بڵاو دەبێتەوە، بەڵکو ڕێگرەکە ئەو سوورەیە).[٣] تیرمیزیو ئەبوداودیش ڕیوایەتیان کردوە. ئەمە وتەکەیانە(بخۆن و بخۆنەوە،ئەو درەوشاوەیە ی بەرز دەبێتەوە پەشیمانتان نەکاتەوە، بخۆن و بخۆنەوە هەتا ئەو سووراییە دەبێتە ڕێگر لێتان)[٤] ئیبنوجەریر ڕیوایەتی کردوە لە سەمورەی کوڕی جوندەبەوە، دەڵێت: پێغەمبەری خودا(ﷺ)(بانگی بیلال لێتان تێکنەدا؟ (یَعمُود الصبح)، هەتا سپیایی بە کەناری ئاسماندا بڵاو دەبێتەوە)[٥] موسلمیش لە سەحیحەکەیدا هەر وا هێناویەتی[٦].

## کەسێ لەشی گران بێ هیچ زیانێکی نیە بۆ ڕۆژووەکەی کە ڕۆژی کردوە

مەسەلەیەك: خودای مەزن بەرەبەیانی کردۆتە کۆتایی کاتی وازهێنان لە خواردن و خواردنەوەو سەرجێیی کردن، هەر کەسێ ویستی ڕۆژوو بگرێت ئەمە دەکاتە بەڵگە لەسەر ئەوە، ئەگەر بەیانی هەڵساو لەشی گران بوو با خۆی بشوات و لەسەر ڕۆژوەکەی بەردەوام بێ،هیچ گوناهێکی ناکات، ئەمە ڕێڕەوی هەر چوار پێشەواکەو کۆمەڵی زانایانی پێشینەو پاشینەشە(السلف و الخلف) وەك بوخاری و موسلیم ڕیوایەتیان کردوە لە فەرمودەکەی عائیشەو ئوموسەلەمەدا(ڕەزای خوایان لێ بێ) کە وتویانە: پێغەمبەری خودا(ﷺ) ڕۆژی لێ بوەتەوەو لەشی گران بووە بەهۆی چوونە لای هاوسەرەوە(بەهۆی خەو بینینەوە نەبوو)، پاشان خۆی دەشۆردو بەڕۆژووەدە بوو، وە لە فەرمودەکەی ئوموسەلەمەشدا هاتوە: نە دەیشکاندو نە قەزاشی دەکردەوە.[٧] لە سەحیحی موسلیما هاتووە لە عائیشەوە(ڕەزای

---

[١] موحەممەدی کوڕی عەلی کوڕی حوسەینو ئەبومیجلزو ئیبراهیمی نەخەعیو ئەبوزوحاو ئەبوائیلو کەسانی تریش لە هاوەڵەکانی ئیبنومەسعودو عەتاو حەسەنو حەکەمی کوڕی عویەینەو موجاهیدو عوروەی کوڕی زوبەیرو ئەبوشەعساء جابیری کوڕی زەید، ئەعمەشو موعەمەری کوڕی ڕاشیدیش هەمان بۆچونیان هەیە

[٢] فتح الباري(٤/١٦٢)، مسلم(٢/٢/٧٦٨).

[٣] أحمد(٤/٢٣)، سەنەدەکانی حەسەنە.

[٤] تحفة الاحوذي(٣/٣٨٩)، سەنەدەکانی حەسەنە.

[٥] الطبري(٣/٥١٧).

[٦] مسلم(٢/٧٨١).

[٧] فتح الباري(٤/١٨٢)، مسلم(٢/٧٨١).

خوای لیّ بیّ): پیاویّك دەلّیّت:ئەی پیّغەمبەری خودا(ﷺ) جاری وا هەیە كاتی نویّژ دیّتو من لەشم گرانە، ئایا بەڕۆژوو بم؟ پیّغەمبەری خودا(ﷺ) فەرمووی: (منیش جاری وا هەیە كاتی نویّژ دیّت لەشم گرانەو كەچی بەڕۆژوویش دەبم، پیاوەكە دەلّیّت: ئەی پیّغەمبەری خودا(ﷺ) تۆ وەك ئیّمە نیت، چونكە خودا لە گوناهی سەرەتاو كۆتاییت خۆشبووە. پیّغەمبەر(ﷺ) فەرمووی: (سویّند بە خوا من هیوام وایە لە هەمووتان زیاتر لە خوا ترس بمو شارەزا تریم،كە چۆن خۆم بپاریّزم لە سزای خودا)[1].

## ڕۆژوو بە هاتنی شەو كۆتایی دیّتو خیّرا ڕۆژو شكاندن دەست پیّدەكات

﴿ثُمَّ أَتِمُّوا الصِّيَامَ إِلَى اللَّيْلِ﴾ پاشان ڕۆژووتان تەواو بكەن تا شەودیّت. شكاندنی ڕۆژوو لە كاتی خۆرئاوا بووندا بڕیاریّكی شەرعیە، وەك لەهەردووسەحیحەكەدا هاتووە لەئەمیری موسوڵمانانەوە عومەری كوڕی خەتاب(ڕەزای خوای لیّ بیّ) دەلّیّت: پیّغەمبەری خودا(ﷺ) فەرموویەتی: (ئەگەر شەو لەویّوە هاتو ڕۆژ لەویّوە ئاوا بوو، ئەوە ئیتر ڕۆژووەوان ڕۆژوو دەشكیّنیّ)[2]، لە سەهلی كوڕی سەعدی ساعیدیەوە(ڕەزای خوای لیّ بیّ) دەلّیّت: پیّغەمبەری خودا فەرمووی(ﷺ)(خەلّكی تا پەلەبكەن لەڕۆژوو شكاندندا لە خیّری بەردەوامدان)[3] ئیمامی ئەحمەدیش ڕیوایەتی كردوە لە ئەبوهورەیرەوە لە پیّغەمبەری خوداوە(ﷺ) فەرموویەتی: (خودای مەزن ئەفەرمویّت: خۆشەویسترینی عەبدەكانم لای من ئەوانەن بە پەلە تر ڕۆژوو دەشكیّنن)[4]، تیرمیزیش ڕیوایەتی كردوەو[5] دەلّیّت: فەرموودە یەكی (حەسەن)غەریبە.

## قەدەغە كردنی بەدەم یەكەوەدانی شەوو ڕۆژ بۆ ڕۆژوو گرتن

فەرموودەی سەحیح هاتووە لەسەر قەدەغەكردنی شەوو ڕۆژ دانە دەمی یەكتر لە ڕۆژوو گرتندا، واتە ڕۆژیّ بدریّتە دەم ڕۆژیّكی ترو شتیّ لە نیّوانیاندا نەخوریّت. ئیمامی ئەحمەد ڕیوایەتی كردوە لە ئەبوهورەیرەوە، دەلّیّت: پیّغەمبەری خودا(ﷺ) فەرموویەتی: (دووڕۆژ مەدەنە دەم یەك لە ڕۆژوو گرتندا) وتیان: ئەی پیّغەمبەری خودا(ﷺ) خۆ تۆ شەوو ڕۆژ دەدەیتە دەم یەك؟ پیّغەمبەر(ﷺ) فەرمووی: (بیّگومان من وەك ئیّوەنیم، من كە شەوگار بەسەر دەبەم پەروەردگارم خواردنو خواردنەوەم پیّ دەبەخشیّ)، دەلّیّت: كۆلّیان نەدا لە ڕۆژ دانە دەم یەك. پیّغەمبەری خودا(ﷺ) دوو ڕۆژو دوو شەو مۆلّەتی پیّدان، پاشان مانگی یەك شەوەیان بینی فەرمووی: (ئەگەر مانگ دوا بكەوتایە

---

[1] مسلم(۲/۷۸۱).

[2] فتح الباري(٤/۲۳۱).

[3] فتح الباري(٤/۲۳٤)، مسلم(۲/۷۷۱).

[4] أحمد(۲/۲۳۷)، تیرمیزی دەلّیّ: حەسەنی غەریبە.

[5] تحفة الاحوذي(۳/۳۸٦)، حەسەنی غەریبە.

بۆ ئەو ئەندازەیەشی، بۆم زیاد دەکرن وەك سزایەك بۆیان). بوخاریو موسلیم لە هەردوو سەحیحەکەیاندا هێناویانە.[1] لە ڕووی ترەوە هاتوە کە قەدەغەی ڕۆژ دانە دەم یەك قەدەغە کراوە، لە فەرمودەی سەحیحدا هاتووە ڕۆژو دانە دەمیەك لە تایبەت مەندیەکانی پێغەمبەرە(ﷺ) کە توانای ئەوەی هەیەو یارمەتی ئەدرێت، ڕوونتر ئەوەیە ئەو خواردنو خواردنەوەیە لە هەقی پێغەمبەر(ﷺ) خۆیەتی، مەعنەویەو هەستی نیە، چونکە ئەگەر وا نەبێ، ئەوە بەردەوام نابێ لەگەڵ هەستیدا، بەڵام کەسێ پێی خۆشە. خۆی بگرێتەوە دوای مەغریب هەتا کاتی پارشێو بۆی هەیە، وەك لە فەرمودەکەی ئەبوسەعیدی خودەریدا(ڕەزای خوای لێ بێ) هاتووە، دەڵێت: پێغەمبەری خودا(ﷺ) فەرموویەتی: (ڕۆژ مەدەنە دەم یەك، هەرکەسێ لە ئێوە دەیەوێت ڕۆژو بداتە دەمیەك باهەتا پارشێو بیدات)، وتیان: تۆ ئەی پێغەمبەری خودا ڕۆژ ئەدەیتە دەمیەك. فەرمووی: (من وەك ئێوە نیم، من شەوگار بەسەردەبەم کەسێ خواردن پێدەداتو کەسێکیش ئاوم پێدەدات) لە هەردوو سەحیحەکەدا بوخاریو موسلیم هێناویانە[2].

## حوکمەکانی مانەوە لە مزگەوتدا(الاعتكاف)

﴿وَلَا تُبَٰشِرُوهُنَّ وَأَنتُمۡ عَٰكِفُونَ فِي ٱلۡمَسَٰجِدِۗ﴾ هەر کاتێ لە مزگەوتدا مانەوە. نزیکی ژنان مەکەون. عەلی کوڕی ئەبوتەلحە لە ئیبنوعەبباسەوە، دەڵێت: ئەمە دەربارەی پیاوێکەکە لە مزگەوتدا دەمێنێتەوە لە ڕەمەزانوکاتی تریشدا، ئەوە لێی قەدەغەیە ژن مارە بکات بە شەو یان بە ڕۆژ هەتا مانەوەکەی لە مزگەوت تەواو دەکات.[3] زەحاك دەڵێت: کاتێ پیاوێ لە مزگەوت بمایەتەوەو لە مزگەوت دەرچوایە ئارەزووی خۆیی بوو سەرجێی بکردایە، خودای مەزن فەرمووی: ﴿وَلَا تُبَٰشِرُوهُنَّ وَأَنتُمۡ عَٰكِفُونَ فِي ٱلۡمَسَٰجِدِۗ﴾ واتە: هەرکاتێ لە مزگەوتدا مانەوە، سەرجێی مەکەن لەگەڵ ژنەکانتاندا. واتە: نزیکی ژنان مەکەون هەتا لە مزگەوتدا بمێننەوە، یا لە کاتی مانەوەتاندا لە مزگەوت دەرچوون[4] موجاهیدو قەتادەو کەسانی تریش هەر وایان وتوە: ئەوان لەکاتی (ئیعتیکاف)دا لەمزگەوت دەچوونەدەرەوە و سەردانی ماڵیاندەکرد، پاشان دەهاتنەوە بۆمزگەوت، لەوکاتەدا سەرجێییان دەکرد. هەتا ئەم ئایەتە هاتە خوارەوە[5] ئیبنوئەبی حاتەم ڕیوایەتی کردوە لە ئیبنومەسعودو

---

[1] أحمد(٢/٢٨١)، فتح الباري(٤/٢٣٨)، مسلم(٢/٧٧٤).

[2] فتح الباري(٤/٣٣٨).

[3] الطبري(٣/٥٤٠).

[4] الطبري(٣/٥٤١).

[5] الطبري(٣/٥٤١).

موحەممەدی کوڕی کەعب‌و موجاهیدو عەتاو حەسەن‌و قەتادەو سوودیی‌و زەححاك‌و ڕەبیعی کوڕی ئەنەس‌و موقاتیل وتیان: نابێ پیاو نزیکی ژن بکەوێتەوە کە لە مزگەوتدا دەمێنێتەوە[1] ئەمەی کە لەم زانایانەوە باس کراوە، ئەمە فەرمانێکە کۆ دەنگی زانایانی لەسەرە، ئەو کەسەی لە مزگەوتدا دەمێنێتەوەچوونەلای ژنی لێ قەدەغەیە هەتا لە مزگەوتدا بمێنێتەوە، یا بشگەڕێتەوە بۆماڵەوە بۆ شتێك کە زۆر پێویستی پێی بێت، دروست نیە بۆی ئەوەندە نەبێ کە پێویستیەکەی تەواو بکات، وەك چوونە سەرئاو یان خواردنێك، ئیتر بۆی نیە ژنەکەی ماچ بکات یان باوەشی پێدا بکات،یان خۆی سەرقاڵ بکات بە هیچ شتێکەوە جگە لەو مانەوەیەی لە مزگەوت، بۆی نیە سەردانی نەخۆشیش بکات، بەڵام لە ڕێگەدا دەتوانێ هەواڵی بپرسێ، مانەوە لە مزگەوت فەرمان‌و بڕیاری تایەبەتی خۆی هەیە، لە شوێنی خۆیدا بە درێژی بەشێکی باشمان لە کۆتایی باسی ڕۆژودا لە کتێبی(الصیام) وەهێناوە، (سوپاس‌و ستایش بۆ خودای مەزن). زانایانی فیقهیش (الفقهاء) ئەوانەی کتێبیانو نوسیوە دوای بەشی ڕۆژوو باسی مانەوەیان لە مزگەوت (الاعتکاف) کردوە، وەك پەیڕەوێك لە قورئانی پیرۆز کە دوای ڕۆژو وباسی مانەوە کە مزگەوتی کردوە. خودای مەزن دوای ڕۆژوو هێمای بۆ مانەوە لە مزگەوت کردوە یان لە کۆتایی مانگی ڕەمەزاندا، وەك لە فەرموودەدا هاتووە لە پێغەمبەری خوداوە(ﷺ) کە لە دە ڕۆژی دوایی مانگی ڕەمەزاندا دەمایەوە هەتا کۆچی دوایی کرد، پاشان خێزانەکانی دوای خۆی هەر دەمانەوە لە مزگەوت (وەك بوخاریی‌و موسلیم هێناویانە لە فەرموودەکەی عائیشەوە) دایکی موسوڵمانان(ڕەزای خوای لێ بێ)[2] لە هەردوو سەحیحەکەدا هاتووە لە سەفیەی کچی حویەیەوە(حُيَيٍّ) کە سەردانی پێغەمبەری دەکرد(ﷺ) لە مزگەوتدا مابوەوە، ماوەیەك قسەی لەگەڵا دەکرد، پاشان هەڵدەسا بۆ ئەوەی بگەڕێتەوە ماڵەکەی خۆی. ئەو کاتە شەو بوو، پێغەمبەری خودا(ﷺ) هەڵسا لەگەڵی بڕوات هەتا بیگەیەنێتە ماڵەکەی خۆی، شوێنەکەی لە ماڵی ئوسامەی کوڕی زەید بوو. لە تەنیشتی مەدینە، کاتێ کەدەڕۆشتن دوو پیاوی ئەنساریان پێ گەیشت، کاتێ کە پێغەمبەریان بینی، پێیان هەڵگرت. لە ڕیوایەتێکی تردا هاتوە: خۆیان پەنادا، واتە: شەرمیان لە پێغەمبەر کرد(ﷺ) کە خێزانەکەی لەگەڵی بوو. پێغەمبەر(ﷺ) پێی وتن: لەسەر خۆتان، ئەمە سەفیەی کچی حویەیە واتە: پەلە مەکەن، ئەمە سەفیەی کچی حویەیە، واتە: خێزانمە. وتیان: (سبحان الله) ئەی پێغەمبەری خودا(ﷺ). پێغەمبەر(ﷺ) فەرمووی: (بێگومان شەیتان دەگەڕێ لە نەوەی ئادەمدا بەو شوێنەی کە خوێنی پێدا دەگەڕێ، من ترسام لەوەی شەیتان شتێك بخاتە دڵتانەوە) یان فەرمووی: (خراپەیەك(بخاتە

[1] ابن ابي حاتم غ: (١/٣٨٥-٣٨٦-٣٨٧).

[2] فتح الباري(٤/٣١٨)، مسلم(٢/٨٣١).

دڵتانەوە))[1]، شافیعی(ڕەحمەتی خوای لێ بێ) دەڵێت: پێغەمبەر(ﷺ) ویستویەتی ئوممەتەکەی ئاگادار بکاتەوە کە خۆیان بپارێزن لە گومان لە شوێنی خۆیدا، بۆ ئەوەی توشی هەڵەیەك نەیەن، وەك چۆن ئەو دوو کەسە وتیان: (سبحان الله) کە ئەوان هیچ گومانێك بە پێغەمبەر(ﷺ) بەرن لە هیچ شتێکا.( والله أعلم.) پاشان مەبەست بە لێکەوتن (المباشرة) ئەو شتانەیە کە دەبنە هۆی سەرجێیی وەك ماچ کردنو باوەش پیا کردن و شتی تر لەوانە، بەڵام وەرگرتنی پێویستیو ئەو جۆرانە هیچ گوناهێکی تێدا نیە. وەك لە هەردوو سەحیحەکەدا هاتوە لە عائیشەوە(ڕەزای خوای لێ بێ) دەڵێت: پێغەمبەری خودا(ﷺ) سەری لێم نزیك دەکردەوە، بۆم دادەهێنا، من لە دەورەی مانگانەدا بووم(حائض) پێغەمبەری خودا(ﷺ) نەدەهاتە ماڵەوە بۆ پێویستیەکی خۆی نەبێ. عائیشە دەڵێت: ئەگەر نەخۆشێك لە ماڵا بوایە پرسیارم لێ نەدەکرد مەگەر لەو کاتە کەدا بەڕێوە بوومایە.[2] جاپاشان خودای مەزن ئەفەرموێت: ﴿تِلْكَ حُدُودُ ٱللَّهِ﴾ ئەمانە سنووری خودان. واتە: ئەمەی بۆمان ڕوون کردنەوەو فەرزمان کرد لەسەرتانو دیاریمان کرد بۆتان لە ڕۆژو گرتنو فەرمانەکانیو ئەوەی ڕێمان پێدانو ئەوەیش لێمان قەدەغە کردنو باسمان کردو سنوورەکانمان دیاری کردو ئەوەی هەموو سنووری خودان. واتە: هەموو شەرعی خودان،خۆی بۆی داناون. نەیبەزێننو توخنی نەکەون. عەبدوڕەحمانی کوڕی زەیدی کوڕی ئەسلەم دەڵێت: مەبەست بەو سنوورانە ئەو چوارەیە( ئەم ئایەتەی خوێند:) ﴿أُحِلَّ لَكُمْ لَيْلَةَ ٱلصِّيَامِ ٱلرَّفَثُ إِلَىٰ نِسَآئِكُمْ﴾ سەرجێیی ژنان کردنتان لە شەوی ڕەمەزاندا بۆتان ڕەوایە. هەتا دەگاتە: ﴿ثُمَّ أَتِمُّوا۟ ٱلصِّيَامَ إِلَى ٱلَّيْلِ﴾ پاشان ڕۆژووتان تەواو کەن هەتا شەوێ. دەڵێت: باوکم زانایانی تریش هەر وایان دەوتو بەسەریاندا دەخوێندینەوە. ﴿كَذَٰلِكَ يُبَيِّنُ ٱللَّهُ ءَايَٰتِهِۦ لِلنَّاسِ﴾ ئا بەم جۆرە خودا نیشانەکانی خۆی بۆ مەردم ئاشکرا دەکات. وەك چۆن حوکمەکانی ڕۆژوو ئەوەی پەیوەندی بە ڕۆژووەوە هەیە بۆی ڕوونکردنەوە، هەر وایش فەرمانو بڕیارەکانی خۆی لەسەر زمانی پێغەمبەرەکەی موحەممەد(ﷺ) ئاشکرا دەکات بۆتان. ﴿لَعَلَّهُمْ يَتَّقُونَ﴾ بەڵکو خۆ بپارێزن. واتە: فێری ئەوە ببن چۆن شارەزا ببنو چۆن خودا بناسنو گوێڕایەڵی بکەن. وەك ئەفەرموێت: ﴿هُوَ ٱلَّذِى يُنَزِّلُ عَلَىٰ عَبْدِهِۦٓ ءَايَٰتٍۭ بَيِّنَٰتٍ لِّيُخْرِجَكُم مِّنَ ٱلظُّلُمَٰتِ إِلَى ٱلنُّورِ ۚ وَإِنَّ ٱللَّهَ بِكُمْ لَرَءُوفٌ رَّحِيمٌ﴾[3] هەر ئەویشە چەند

---

[1] فتح الباري(٤/٣٢٤)، مسلم(٤/١٧١٢).

[2] فتح الباري(٤/٣٢٠)، مسلم(١/٢٤٤).

[3] الحديد(٩).

نیشانەی ئاشکرای بۆ سەر عەبدی خۆی ناردە خوار تا لە تاریکیەکان بەرەو ڕوناکیتان بەرێ، خودا دەربارەی ئێوە زۆر دڵسۆزو دلۆڤانە.

﴿وَلَا تَأْكُلُوٓا۟ أَمْوَٰلَكُم بَيْنَكُم بِٱلْبَٰطِلِ وَتُدْلُوا۟ بِهَآ إِلَى ٱلْحُكَّامِ لِتَأْكُلُوا۟ فَرِيقًا مِّنْ أَمْوَٰلِ ٱلنَّاسِ بِٱلْإِثْمِ وَأَنتُمْ تَعْلَمُونَ ﴿١٨٨﴾﴾

### حەرامی بەرتیلدان

﴿وَلَا تَأْكُلُوٓا۟ أَمْوَٰلَكُم بَيْنَكُم بِٱلْبَٰطِلِ وَتُدْلُوا۟ بِهَآ إِلَى ٱلْحُكَّامِ لِتَأْكُلُوا۟ فَرِيقًا مِّنْ أَمْوَٰلِ ٱلنَّاسِ بِٱلْإِثْمِ وَأَنتُمْ تَعْلَمُونَ﴾ لە خواردنی ماڵی یەکتر(بە ناڕەوا) دوور کەونەوە، مەشیدەن بە کاربەدەستان، تا ڕێتان هەبێ بە ناڕەوا ماڵی خەڵکی تر بخۆن، ئێوە خۆتان ئەمە دەزانن. عەلی کوڕی ئەبوتەلحە دەڵێت لە ئیبنوعەبباسەوە، ئەمە بۆ پیاوێکە ماڵی خەڵکی لایە، بەڵام هیچ بەڵگەیەکی ئاشکرا نیە لەسەری. حاشا دەکات کە لەلایەتی، خۆیشی چاك دەزانێ کە ئەو ماڵەی لەلایە، بەڵام کێشەکە دەباتە لای کاربەدەستانو دادگا. چاکیش دەزانێ کە گوناهبارەو حەرام دەخوات[1]: کێشە مەکە کە، خۆت چاك دەزانی تۆ ستەمکاری[2].

### بڕیاری دادوەر نە حەرام حەلاڵ دەکاو نە حەلاڵیش حەرام دەکات

لە هەردوو سەحیحەکەدا هاتووە لە ئوموسەلەمەوە کە پێغەمبەری خودا(ﷺ) فەرموویەتی: (دڵنیا بن، منیش هەر مرۆڤم، کەسانی ناکۆكو کێشە دار دێنە لام، ڕەنگە هەندێکیان زمان پاراوتر بن لە هەندێکی تریانو ماف بدەم بەو، جا هەرکەس بڕیارم بۆ داو مافی موسوڵمانێکم پێدا، ئەوە با دڵنیا بێت کە من پارچەیەك لە ئاگری بۆ بڕیار ئەدەم، دەبا هەڵی بگرێت یا وازی لێ بێنێت)[3] ئەم ئایەتەو ئەم فەرمودەیە بەڵگەن کە بڕیاری دادوەر لە ڕاستیدا هیچ شتێ ناگۆڕێ نە حەرام حەلاڵ دەکاتو نە حەلاڵ حەرام دەکات. کار بە بەڵگەی ئاشکرا دەکات، پابەندە بەو شتانەوە کە وا دەردەکەوێ وایە، ڕێکە لەگەڵ ئەو بڕیارەدا کە ئەیدات، دیارە دادوەر پاداشتی خۆی وەردەگرێ. تاوانەکە لەسەر ئەوەیە کە فڕو فێڵ دەکات. هەر بۆیە:لەوئایەتەی سەرەوەدا لەوبارەیەوە ڕێنمایمان دەکات وئاگاداریمان پێدەدات.. ﴿وَلَا تَأْكُلُوٓا۟ أَمْوَٰلَكُم بَيْنَكُم بِٱلْبَٰطِلِ وَتُدْلُوا۟ بِهَآ إِلَى ٱلْحُكَّامِ لِتَأْكُلُوا۟ فَرِيقًا مِّنْ أَمْوَٰلِ ٱلنَّاسِ

---

[1] الطبري(٣/٥٥٠). هەر بەمجۆرە ڕیوایەت کراوە لە موجاهیدو سەعیدی کوڕی جوبەیرو عیکرمەو حەسەنو قەتادەو سوودیو موقاتیلی کوڕی حەیانو عەبدوڕەحمانی کوڕی زەیدی کوڕی ئەسلەم کە وتویانە.

[2] ابن ابي حاتم(١/٣٩٣-٣٩٤)، الطبري(٣/٥٥٠-٥٥١).

[3] فتح الباري(١٣/١٩٠)، مسلم(٣/١٣٧٣).

بِٱلۡإِثۡمِ وَأَنتُمۡ تَعۡلَمُونَ﴾ قەتادە دەڵێت: ئەی نەوەی ئادەم! بزانە کە بڕیاری دادوەر حەرامت بۆ حەڵاڵ ناکات، هەقی شتی نادروستت بۆ نیە، چونکە دادوەرلەسەرقسەی شایەتەکان بڕیارئەدات، دادوەریش مرۆڤەو هەڵە دەکاو دەشپێکێ. چاك بزانن هەرکەسێ قازی بڕیاری نادروستی بۆ بدات،ئەوا کێشەکەی تەواو نەبووە هەتا خودای مەزن لە ڕۆژی قیامەتا دەیانهێنێ‌و بڕیاری خۆی بەسەر ئەوەدا ئەدات کە ناهەقی کردوە، هەقەکە ئەداتەوە بەو کەسەی ناهەقی پێکراوە بە چاکتر لەوەی کە بڕیار دراوە بۆی لە دنیادا بۆستەمکاران[1].

﴿يَسۡـَٔلُونَكَ عَنِ ٱلۡأَهِلَّةِۖ قُلۡ هِيَ مَوَٰقِيتُ لِلنَّاسِ وَٱلۡحَجِّۗ وَلَيۡسَ ٱلۡبِرُّ بِأَن تَأۡتُواْ ٱلۡبُيُوتَ مِن ظُهُورِهَا وَلَٰكِنَّ ٱلۡبِرَّ مَنِ ٱتَّقَىٰۗ وَأۡتُواْ ٱلۡبُيُوتَ مِنۡ أَبۡوَٰبِهَاۚ وَٱتَّقُواْ ٱللَّهَ لَعَلَّكُمۡ تُفۡلِحُونَ ١٨٩﴾

### پرسیار دەربارەی نوێبوونەوەی مانگ

عەوفی لە ئیبنوعەبباسەوە دەڵێت، خەڵکی پرسیاریان لە پێغەمبەری خودا کرد(ﷺ) دەربارەی مانگ نوێ بوونەوە،جا ئەم ئایەتە هاتە خوارەوە: ﴿يَسۡـَٔلُونَكَ عَنِ ٱلۡأَهِلَّةِۖ قُلۡ هِيَ مَوَٰقِيتُ لِلنَّاسِ وَٱلۡحَجِّۗ﴾ دەربارەی مانگ نوێبوونەوەش لێت دەپرسن، بڵێ: بۆ زانین‌و کات‌و چوونە حەجی خەڵکی بەهرە دەگەیەنێ. واتە: بەهۆی نوێ بوونەوەی مانگەوە، بۆ دانەوەی قەرز، سووڕی مانگانەی ژنان‌و حەج کردن سوودی لێ وەردەگرن.[2] عەبدوڕەزاق ڕیوایەتی کردوە لە ئیبنوعەمەرەوە دەڵێت: پێغەمبەری خودا(ﷺ) فەرموویەتی: (خودای مەزن مانگ نوێ بوونەوەی کردۆتە هۆکاری(دیاری کردنی) کاتەکان بۆ مەردم، ڕۆژوو بگرن بە بینینی‌و ڕۆژوویش بشکێنن بە بینینی، خۆ ئەگەر هەور بەر چاوی گرتن ئەوە سی ڕۆژ تەواو بکەن(واتە شەعبان)[3].

### جۆری چاکە کردن لەبەرخواترسیی

﴿وَلَيۡسَ ٱلۡبِرُّ بِأَن تَأۡتُواْ ٱلۡبُيُوتَ مِن ظُهُورِهَا وَلَٰكِنَّ ٱلۡبِرَّ مَنِ ٱتَّقَىٰۗ وَأۡتُواْ ٱلۡبُيُوتَ مِنۡ أَبۡوَٰبِهَاۚ﴾

واش چاك نیە لە پشتی خانوەکانتانەوە بچنە ژورەوە، چاکە ئەوەیە ئەو کەسە پارێزگارو لە خوا ترس بێ. لە دەرگاکانەوە بچنە ماڵانەوە. بوخاری لە بەرائەوە ڕیوایەتی کردوە لەکاتی نەفامیدا، کاتێ لە ئیحرامدا بوونایە،لە پشتی خانوەکانەوە دەچوونە ژوورەوە،جا خودای مەزن ئەم ئایەتەی ناردە

---

[1] الطبري(٣/٥٥٠).

[2] الطبري(٣/٥٥٤).

[3] عبدالرزاق(٤/١٥٦). حاکیم ڕیوایەتی کردوە لە موستەدرەکەکەیداو دەڵێت سەنەدەکەی سەحیحە بەڵام بوخاری‌و موسلیم نەیانهێناوە.

خوارەوە: ﴿وَلَيْسَ ٱلْبِرُّ بِأَن تَأْتُوا۟ ٱلْبُيُوتَ مِن ظُهُورِهَا وَلَٰكِنَّ ٱلْبِرَّ مَنِ ٱتَّقَىٰ ۗ وَأْتُوا۟ ٱلْبُيُوتَ مِنْ أَبْوَٰبِهَا﴾[١]. هەر بەو جۆرە ئەبوداوودی تیالیسی ڕیوایەتی کردوە لە بەرائەوە، دەڵێت: ئەنساریەکان کاتێ لەسەر بهانتایەتەوە، پیاوەکە لە دەرگاکەی خۆیەوە نەدەچوە ژوورەوە،ئیتر ئەم ئایەتە هاتە خوارەوە،[٢] حەسەنی بەسری، دەڵێت: کۆمەڵێ لە خەڵکی ئەهلی نەفامی، ئەگەر یەکێکیان نیازی سەفەری بوایە، لە ماڵ ئەچووە دەرەوە، دەیویست ئەو سەفەرەی بکات کە بۆی دەرچووە، دوای ئەوە لە ماڵ دەچووە دەرەوە، بۆی دەردەکەوێ کە دەمێنێتەوەو واز لە وسەفەرەی دەهێنێ، لە دەرگای ماڵەوە نەدەچووە ژوورەوە، لە پشتەوە دەچووە ژورەوە،ئیتر خودای گەورە فەرمووی: ﴿وَلَيْسَ ٱلْبِرُّ بِأَن تَأْتُوا۟ ٱلْبُيُوتَ مِن ظُهُورِهَا﴾[٣] باش وا نیە لە پشت خانوەکانتانەوە بچنە ژورەوە ﴿وَٱتَّقُوا۟ ٱللَّهَ﴾ ترستان لە خودا هەبێ، واتە: لە خودا بترسن، ئەو کارە بکەن کە فەرمانتان پێدەکات بیکەن، دوربکەونەوە لەو شتانەی لێی قەدەغە کردون ﴿لَعَلَّكُمْ تُفْلِحُونَ﴾ بەڵکو بتوانن ڕزگار بن، لە ڕۆژی قیامەتا کاتێ لەبەر دەم خودای گەورەدا ڕاوەستاون کە بە تێرو تەواوی پاداشتتان ئەداتەوە.

﴿وَقَٰتِلُوا۟ فِى سَبِيلِ ٱللَّهِ ٱلَّذِينَ يُقَٰتِلُونَكُمْ وَلَا تَعْتَدُوٓا۟ ۚ إِنَّ ٱللَّهَ لَا يُحِبُّ ٱلْمُعْتَدِينَ ﴿١٩٠﴾ وَٱقْتُلُوهُمْ حَيْثُ ثَقِفْتُمُوهُمْ وَأَخْرِجُوهُم مِّنْ حَيْثُ أَخْرَجُوكُمْ ۚ وَٱلْفِتْنَةُ أَشَدُّ مِنَ ٱلْقَتْلِ ۚ وَلَا تُقَٰتِلُوهُمْ عِندَ ٱلْمَسْجِدِ ٱلْحَرَامِ حَتَّىٰ يُقَٰتِلُوكُمْ فِيهِ ۖ فَإِن قَٰتَلُوكُمْ فَٱقْتُلُوهُمْ ۗ كَذَٰلِكَ جَزَآءُ ٱلْكَٰفِرِينَ ﴿١٩١﴾ فَإِنِ ٱنتَهَوْا۟ فَإِنَّ ٱللَّهَ غَفُورٌ رَّحِيمٌ ﴿١٩٢﴾ وَقَٰتِلُوهُمْ حَتَّىٰ لَا تَكُونَ فِتْنَةٌ وَيَكُونَ ٱلدِّينُ لِلَّهِ ۖ فَإِنِ ٱنتَهَوْا۟ فَلَا عُدْوَٰنَ إِلَّا عَلَى ٱلظَّٰلِمِينَ ﴿١٩٣﴾﴾

## فەرماندان بە شەڕ کردن دژی ئەوانەی شەڕ دەفرۆشن وفەرماندان بە کوشتنیان لە هەر کوێ دەست کەون

ئەبوجەعفەری ڕازی دەڵێت: لە ڕەبیعی کوڕی ئەنەسەوە لە ئەبولعالیەوە لەم ئایەتەدا ﴿وَقَٰتِلُوا۟ فِى سَبِيلِ ٱللَّهِ ٱلَّذِينَ يُقَٰتِلُونَكُمْ﴾ ئێوە لەگەڵ ئەوانەدا کە شەڕ بە ئێوە دەفرۆشن، لە ڕێی خوادا بجەنگن. دەڵێت: ئەم ئایەتە یەکەم ئایەتە دەربارەی جەنگ کردن. هاتۆتە خوارەوە لە مەدینداوە کاتێ کە هاتە خوارەوە، پێغەمبەری خودا(ﷺ) لەگەڵ ئەوانەدا شەڕی دەکرد کە شەڕیان لەگەڵی دەکرد. وازی

---

[١] الفتح الباري(٣١/٨)، فەرموودەیەکی سەحیحە.

[٢] مسند الطيالس(٩٨).

[٣] إبن أبي حاتم غ: (٤٠١/١).

لەوانە هێنابوو شەڕیان لەدژی نەدەکرد، هەتاسورەتی بەرائەت (براءة) هاتە خوارەوە[1] عەبدوڕەحمانی کوڕی زەیدی کوڕی ئەسلەم هەر وای وتوە، تەنانەت وتویەتی: ئەم ئایەتە، بەم دەقە کە خودای مەزن ئەفەرموێت: ﴿فَاقْتُلُوا الْمُشْرِكِينَ حَيْثُ وَجَدتُّمُوهُمْ﴾[2] (نەسخ) بوەتەوە ئەو بتپەرستانەت لە کوێ وەدەس کەوت لە کوشتنیان دەس مەپارێزە. ئەمە جێی تێڕوانینە، بۆیە خودای مەزن لێرەدا ئەفەرموێت: ﴿الَّذِينَ يُقَاتِلُونَكُمْ﴾ ئەوانەی شەڕتان پێ دەفرۆشن. ئەمە هەڵنانو ئامادەکردنی موسوڵمانان بوو دژی ئەو دوژمنانەی کە هەموو کارێکیان خۆ ئامادەکردن شەڕ وفرۆشتنەلە خەڵکی موسوڵمان، واتە: خودای مەزن فەرمان دەکات بە خاوەن باوەڕان کە ئەوانیش شەڕ دژی دوژمن بکەن وەک ئەوان دەیکەن لەگەڵتانو ئەفەرموێت ئێوەش بیانکوژن. وەک لە ئایەتێکی ترا ئەفەرموێت: ﴿وَقَاتِلُوا الْمُشْرِكِينَ كَافَّةً كَمَا يُقَاتِلُونَكُمْ كَافَّةً﴾[3]، بجەنگن دژی بت پەرستان بە تێکڕا هەروەک ئەوان دژی ئێوە دەجەنگن بە تێکڕا. هەر بۆیە لەم ئایەتەشدا ئەفەرموێت: ﴿وَاقْتُلُوهُمْ حَيْثُ ثَقِفْتُمُوهُمْ وَأَخْرِجُوهُم مِّنْ حَيْثُ أَخْرَجُوكُمْ﴾ لە هەر شوێنێ دەستتان کەوتن بیانکوژن، لەو شوێنەشیان وەدەر بێنن کە ئێوەیان وەدەرنا. وەک چۆن ئەوان گشت هەوڵێکیان هەر ئەوەیە شەڕتان پێ بفرۆشنو دەرتان بکەن لە زێدی خۆتان، سا ئێوەش هەموو هەوڵێکتان بخەنە کار بۆ تۆڵەلێکردنەوەیانو دەرکردنیان لە وڵاتی خۆیان.

## قەدەغە کردنی لاشە برین و خەیانەتو دەست درێژی کردن

خودای مەزن ئەفەرموێت: ﴿وَلَا تَعْتَدُوا إِنَّ اللَّهَ لَا يُحِبُّ الْمُعْتَدِينَ﴾ نابێ دەسدرێژی بکەن، خودا دەسدرێژ کەرانی خۆش ناوێ. واتە: لە ڕێی خوادا بجەنگن، بەڵام دەسدرێژی مەکەن، ئەمە هەموو ئەو شتانە دەگرێتەوە کە خودا قەدەغەی کردون. وەک حەسەنی میسری دەڵێ: لە برینی ئەندامەکانی لەشو خەیانەتو کوشتنی ژنانو منداڵو پیرو پەک کەوتە کە هیچ دەستەڵاتیان نیەو شەڕەکە پەیوەندی بە ئەوانەوە نیە.هەروەها قەشەو ئەوانەی وان لە پەرستگاکانداو برینی دارو درەخت وکوشتنی ئاژەڵ مەگین لەبەر بەرژەوەندیەێك، ئەمانە هەموو لە قەدەغە کراوەکانن لە کاتی جەنگا. وەک ئیبنوعەبباسو عومەری کوڕی عەبدولعەزیزو موقاتیلی کوڕی حەیانو کەسانی تریش وتویا، وەک لە سەحیحی موسلیم یشدا هاتوە لە بورەیدەوە(بريدة) کە پێغەمبەری خودا ئەیفەرموو:

---

[1] الطبري(٣/٥٦١).

[2] التوبة(٥).

[3] التوبة(٣٦). الطبري(٣/٥٦٢).

(غەزا بکەن لە ڕێی خوادا، بجەنگن لەگەڵ ئەوانەدا کە بڕوایان بە خوا نیە، غەزا بکەن،خەیانەت مەکەن. ستەم مەکەن، ئەندامەکانی لاشە مەبڕن، منداڵو خاوەن پەرستگاکان مەکوژن(أصحاب الصوامع))[1] لە هەردوو سەحیحەکەشدا هاتوە لەئیبنوعومەرەوە دەڵێت: لە یەکێ لە غەزاکانی پێغەمبەردا(ﷺ) ژنێکم بەکوژراوی دیتەوە، پێغەمبەری خودا(ﷺ) ناڕەزایی دەربڕی دەربارەی کوشتنی ژنانو منداڵان[2] فەرموودەو ئاسار لەم بارەیەوە ئێجار زۆرە.

## بت پەرستن زۆر لە کوشتن خراپترە

هەرچەند غەزاکردن،گیان لە دەستدانو پیاو کوشتنی تێدایە،بەڵام خودای مەزن ئاگاداری داوە کە ئەوەی ئەو بت پەرستانە خەریکینی لە خوانەناسیو هاوەڵ دانان بۆیو ڕێگری لە ڕێی خوادا،زۆر گەورەترو خراپترە لە کوشتن، هەر بۆیە خودای گەورە ئەفەرموێت: ﴿وَٱلْفِتْنَةُ أَشَدُّ مِنَ ٱلْقَتْلِ﴾ فیتنە نانەوە زۆر لە کوشتن خراپترە. ئەبومالیك دەڵێت: ئەوەی بووەبەخولیای ئێوە، لە کوشتن گەورەترە[3] ئەبولعالیەو موجاهیدو سەعیدی کوڕی جوبەیرو عیکرمەو حەسەنو قەتادەو زەححاكو ڕەبیعی کوڕی ئەنەس لەمانای ئەم دەقەدا ﴿وَٱلْفِتْنَةُ أَشَدُّ مِنَ ٱلْقَتْلِ﴾. دەڵێن: بت پەرستی لە کوشتن خراپترە.

## قەدەغە کردنی جەنگ لە حەرەمداو دروستی بەرگری کردن لە پەلاماردەر

خودای مەزن ئەفەرموێت: ﴿وَلَا تُقَٰتِلُوهُمْ عِندَ ٱلْمَسْجِدِ ٱلْحَرَامِ﴾ لەدەوروبەری (مسجدالحرام)یشدا نابێ شەڕیان لەگەڵ بکەن. وەك لە هەردوو سەحیحەکەدا هاتوە: (بێگومان ئەم شارە خودا حەرامی کردوە لەو ڕۆژەوە کە ئاسمانەکانو زەمینی دروست کردوە، ئەمە حەرام کراوە بە حەرام کردنی خودا، هەتا ڕۆژی قیامەت، بۆ منیش حەڵاڵ نەکراوە جگە لە ساتێك لە ڕۆژدا، ئەمەیش ساتەکەی منە، ئەمە حەرام کراوە بە حەرام کردنی خودا هەتا ڕۆژی قیامەت، درەختی نابڕێت، گژو گیای هەڵناکنرێ، ئەگەر کەسێ ڕێی پێدا. بە شەڕکردنی پێغەمبەر(تێیدا)(ﷺ) بڵێن: بێگومان خودا ئیزنی پێغەمبەرەکەی دا(ﷺ) ئیزنی ئێوەی نەداوە)[4]، مەبەستی پێغەمبەر(ﷺ) ئەو شەڕە بووە کە کردی لەگەڵ خەڵکەکەیدا لە ڕۆژی فەتحی مەککەدا کە ڕزگاری کرد، هەندێ کەسیان لێ کوژرا لە لای خەندەمەدا(الخَندمَة) پاشان پێغەمبەری خودا(ﷺ) دڵنیای کردنو فەرمووی: (هەر کەسێ دەرگای خۆی داخست بێ ترسە،

---

[1] مسلم(٣/١٣٥٧).

[2] فتح الباري(٦/١٧٢)، مسلم(٣/١٣٦٤).

[3] إبن أبي حاتم غ: (١/٤١٢).

[4] فتح الباري(٦/٣٢٧)، مسلم(٢/٩٨٦/٩٧٧).

هەرکەسێ چووە مزگەوت بێ ترسە، هەرکەسێ چووە ماڵی ئەبوسوفیان بێ ترسە)[1]، پاشان خودای مەزن ئەفەرموێت: ﴿حَتَّىٰ يُقَـٰتِلُوكُمْ فِيهِ ۖ فَإِن قَـٰتَلُوكُمْ فَٱقْتُلُوهُمْ ۗ كَذَٰلِكَ جَزَآءُ ٱلْكَـٰفِرِينَ﴾ مەگین ئەوان لەوێ شەڕتان پێ بفرۆشن، ئەگەر لەوێش شەڕیان پێ فرۆشتن، لە کوشتنیان ڕامەوەستن، پاداشتی خوانەناسان هەر ئەوەیە. خودای مەزن ئەفەرموێت: لەلای (مسجد الحرام)دا شەڕیان لەگەڵدا مەکەن، وەختێ نەبێ کە ئەوان دەس پێشخەری بکەنو شەڕتان پێ بفرۆشن، ئێوەش بۆتان هەیە لەو کاتەدا بچن بە گژیاندا، بۆ خۆ پارێزی لە دەس درێژیکار، وەك پێغەمبەری خودا(ﷺ) پەیمانی وەرگرت لە هاوەڵەکانی لە ڕۆژی حودەیبیەدا لە ژێر درەختەکەدا لەسەر جەنگ کردن، کاتێ کە بنەماڵەکانی قورەیشو ئەوانەی کە پشتگیریان لێدەکردن لە سەقیفو ئەحباشەکان لێی کۆ بوونەوە لەو ساڵەدا. پاشان خودای گەورە ڕێگری کردو نەیهێشت شەڕ لە نێوانیاندا ڕووبدات و فەرمووی: ﴿وَهُوَ ٱلَّذِى كَفَّ أَيْدِيَهُمْ عَنكُمْ وَأَيْدِيَكُمْ عَنْهُم بِبَطْنِ مَكَّةَ مِنۢ بَعْدِ أَنْ أَظْفَرَكُمْ عَلَيْهِمْ﴾[2] هەر ئەویش بوو لە دەست ئەوانی پارازتن، ئەوانیش لە دەس ئێوە، وەختێ لە لای مەککەدا کردیو ئێوە بەسەریاندا زاڵ بوون.هەروەها فەرموویەتی: ﴿وَلَوْلَا رِجَالٌ مُّؤْمِنُونَ وَنِسَآءٌ مُّؤْمِنَـٰتٌ لَّمْ تَعْلَمُوهُمْ أَن تَطَـُٔوهُمْ فَتُصِيبَكُم مِّنْهُم مَّعَرَّةٌۢ بِغَيْرِ عِلْمٍ ۖ لِّيُدْخِلَ ٱللَّهُ فِى رَحْمَتِهِۦ مَن يَشَآءُ ۚ لَوْ تَزَيَّلُوا۟ لَعَذَّبْنَا ٱلَّذِينَ كَفَرُوا۟ مِنْهُمْ عَذَابًا أَلِيمًا﴾[3] ئەگەر ئێمە ئیزنمان بدایە لە مەککە بچن بە گژیاندا (لەوانەبوو زۆرپیاوو ژنی باوەڕدار) کەئێوە نەتانناسیبوون (پێتان پێدادەنان) دەتانکوشتن، جا بەو هۆیە تووشی تاوان دەبوون کە ئێوە نەتاندەناسین. خودا هەرکەسێ خۆی ویستی لێبێ دەیخاتەبەربەزەیی خۆی، ئەگەر لەو شوێنە لاچوونایە، بێگومان خوا نەناسەکانمان بە ئازارێکی بە ژان دووچار دەکرد. پاشان خودای گەورە ئەفەرموێت: ﴿فَإِنِ ٱنتَهَوْا۟ فَإِنَّ ٱللَّهَ غَفُورٌ رَّحِيمٌ﴾ ئەگەر دەس بەرداریشتان بوون، خودا لە گوناه دەبوریو دلۆڤانە. واتە: ئەگەر وازیان لە شەڕکردن هێنا لە حەرەمی مەککەداو پەشیمان بوونەوەو موسوڵمان بوون. خودا لە گوناهیان دەبووری، با لە حەرەمی خوایشدا موسوڵمانیشیان کوشتبێ. چونکە خودای مەزن بەلایەوە گران نیە خۆش ببێ لە کەسێ تەوبە بکاتو بگەڕێتەوە بۆ لای.

---

[1] أحمد(٢/٢٩٣).

[2] الفتح(٢٤).

[3] الفتح(٢٥).

**فەرماندان بە جەنگ کردن هەتا ئاژاوە( فیتنە ) نامێنێ**

پاشان خودای مەزن فەرمان ئەدات بە جەنگ کردن دژی خوانەناسانو ئەفەرموێت: ﴿وَقَٰتِلُوهُمْ حَتَّىٰ لَا تَكُونَ فِتْنَةٌ﴾ لە کوشتنیان مەوەستن هەتا ئاژاوە لە دنیادا بنەبڕ دەبێ. ئیبنوعەبباسو ئەبوالعالیەو موجاهیدو حەسەنو قەتادەو[1] ڕەبیعو موقاتیلی کوڕی حەیانو سوودیو زەیدی کوڕی ئەسلەم دەڵێن: (فتنە) یانی: تا بت پەرستی نامێنێ[2]. ﴿وَيَكُونَ ٱلدِّينُ لِلَّهِ﴾ دین هەر دینی خودا دەبێ. واتە: هەتا ئاین هەر ئاینی خودا دەبێو زاڵ دەبێو سەردەکەوێ بەسەر گشت ئاینەکانی تردا. وەك لە هەردوو سەحیحەکەدا هاتوە لە ئەبومووسای ئەشعەریەوە دەڵێت: پرسیاریان لە پێغەمبەر کرد(ﷺ) پیاوێك بۆ ئازایەتی شەڕ بکات یا بۆ دەمارگیریو خزمایەتی شەڕ بکات یا بۆ شۆرەت و(ڕیابازی) شەڕ بکات، کام لەمانە لە ڕێگەی خودایە؟ فەرمووی: (هەرکەسێك بجەنگێت بۆ بەرز کردنەوەی وتەی خودان هەر ئەوە لە پێناوی خودادایە)[3] دیسان لە هەردوو سەحیحەکەدا هاتوە: (فەرمانم پێدراوە شەڕ بکەم لەگەڵ خەڵکیادا هەتا دەڵێن(لا إله إلا الله)، کاتێ کە وتیان: خوێنو ماڵیان لە لایەن منەوە پارێزراوە بە هەقی خۆی نەبێ، حیسابیشیان لە لای خودایە)[4] پاشان خودای مەزن ئەفەرموێت: ﴿فَإِنِ ٱنتَهَوْا۟ فَلَا عُدْوَٰنَ إِلَّا عَلَى ٱلظَّٰلِمِينَ﴾ ئەگەر ئەوان دەسبەردار بوون،دەست درێژی هەر لەسەر ستەمکارانە. واتە: ئەگەر وازیان هێنا لەو بت پەرستیو شەڕ کردنەیان ئێوەش وازیان لێ بێنن. دوای ئەوە هەر کەسێ شەڕیان پێ بفرۆشێ، تاوانبارو ناهەقیکارە، دەست تەنیا بۆسەر ستەمکار درێژ دەکرێت. ئەمە هەر وەك قسەکەی موجاهید وایە کە دەڵێ: شەڕ تەنیا لەگەڵ ئەوەداکە شەڕ فرۆشە[5] واتە: ئەگەر وازیان لە بت پەرستی هێنا، ئیتر دوای ئەوە هیچ دەست درێژیەك ناکرێتە سەریان.دەکرێ مەبەستیش لە(العدوان) لێرەدا تۆڵە لێیسەندنەوەو وەڵامدانەوەی ئەو شەڕ فرۆشیەیە. وەك خودای گەورە ئەفەرموێت: ﴿فَمَنِ ٱعْتَدَىٰ عَلَيْكُمْ فَٱعْتَدُوا۟ عَلَيْهِ بِمِثْلِ مَا ٱعْتَدَىٰ عَلَيْكُمْ﴾[6] سا ئەگەر کەسێ دەس درێژی لە ئێوە کرد، ئێوەش هەر بە

---

[1] إبن أبي حاتم غ: (١/٤١٥).
[2] إبن أبي حاتم غ: (١/٤١٦).
[3] فتح الباري(١٣/٤٥٠)، مسلم(٣/١٥١٣).
[4] فتح الباري(١/٥٩٢)، مسلم(١/٥٣).
[5] الطبري(٣/٥٨٤).
[6] البقرة(١٩٤).

ئەندازەی ئەو دەس درێژی بکەنەوە هەروەها ئەفەرموێت: ﴿وَجَزَٰٓؤُاْ سَيِّئَةٖ سَيِّئَةٞ مِّثۡلُهَا﴾[1] سزا بۆ هەر خراپەیەك، خراپەیەکی وەك ئەوە. ﴿وَإِنۡ عَاقَبۡتُمۡ فَعَاقِبُواْ بِمِثۡلِ مَا عُوقِبۡتُم بِهِۦ﴾[2] ئەگەر تۆڵە دەسێننەوە، ئەوە بە ئەندازەی ئەو ستەمەی دژتان کراوە تۆڵە بکەنەوە. هەر بۆیە عیکرمەو قەتادە دەڵێن: ئەو ناهەقیکارەی کە نایەوێ بڵێ: (لا إله إلا الله)[3] بوخاری ڕیوایەتی کردوە، لەبارەی ئەم ئایەتەوە کە ئەفەرموێت: ﴿وَقَٰتِلُوهُمۡ حَتَّىٰ لَا تَكُونَ فِتۡنَةٞ﴾ لە کوشتنیان دریغی مەکەن تا ئاژاوە لە دنیا بنەبڕ دەبێ. لە نافیعەوە لە ئیبنوعومەرەوە، دەڵێت: دوو پیاو هاتنە لای لە ئاژاوەکەی ئیبنوزوبەیردا وتیان: خەڵکی لەناو چوون، تۆیش ئیبنوعومەر کە هاوەڵی پێغەمبەری(ﷺ) چی ڕێگری لێ کردوی کە دەرناچی؟ ئەویش دەڵێت: ئەوەی ڕێگری لە من کردوە خودایە کە خوێنی براکەمی لێ قەدەغە کردوم، وتیان: ئەی خودا نەیفەرموە: ﴿وَقَٰتِلُوهُمۡ حَتَّىٰ لَا تَكُونَ فِتۡنَةٞ﴾ دەڵێت: شەڕمان کرد هەتا ئاژاوە نەمێنیو دین هەر دینی خودا بوو، بەڵام ئێوە دەتانەوێ شەڕ بکەن هەتا ئاژاوە دەرکوت ببێو ئاینیش هی خودا نەبێ. عوسمانی کوڕی سالح ئەمەی بۆ زیاد کردوە: پیاوێ هاتە لای ئیبنوعومەر دەڵێت: ئەی ئەبوعەبدوڕەحمان چی وای لێ کردوی ساڵێ حەج دەکەیو ساڵێ عومرە دەکەی، واز لە جیهاد لە ڕێی خوادا دێنی، چاکیش دەزانی کە خودا (مەردمی) بۆکردنی هانداوە؟ ئەویش دەڵێت: برازای خۆم ئیسلام لەسەر پێنج پایەدامەزراوە: باوەڕ بە خوداو پێغەمبەرەکانیو پێنج نوێژەکەو گرتنی ڕۆژووی ڕەمەزانو زەکات دانو حەجی ماڵی خودا، وتیان: ئەی ئەبوعەبدوڕەحمان ئایا گوێت لەوە نەبوە کە خودا فەرموویەتی لە کتێبەکەیدا، ﴿وَإِن طَآئِفَتَانِ مِنَ ٱلۡمُؤۡمِنِينَ ٱقۡتَتَلُواْ فَأَصۡلِحُواْ بَيۡنَهُمَاۖ فَإِنۢ بَغَتۡ إِحۡدَىٰهُمَا عَلَى ٱلۡأُخۡرَىٰ فَقَٰتِلُواْ ٱلَّتِي تَبۡغِي حَتَّىٰ تَفِيٓءَ إِلَىٰٓ أَمۡرِ ٱللَّهِ﴾[4] هەر کاتێ لە نێوان خاوەن باوەڕان دوو کۆمەڵ بە گژ یەکدا چوون، ئێوە ئاشتیان بکەنەوە، ئەگەر یەکێکیان ویستی ناهەقی لەوی تر بکا، ئێوە بە گژ ئەوەدا بچن کە هەر دەیەوێ شەڕ بکا، هەتا بۆ فەرمانی خودا مل کەچ دەکا. دەڵێت: لە سەردەمی پێغەمبەردا(ﷺ) کە موسوڵمانان کەم بوون ئەوەمان کرد، موسوڵمان لەسەر ئاینەکەی تووشی فیتنە دەبوو، یان دەیانکوشت یان جەزرەبە ئەدرا، هەتا موسوڵمانان زۆر بوونو فیتنە نەما. دەڵێت: ئەی دەربارەی ئیمامی عوسمانو عەلی چی دەڵێیت؟ دەڵێت: لەبارەی عوسمانەوە خودای مەزن لێی بوراو

---

[1] الشورى(٤٠).

[2] النحل(١٢٦).

[3] الطبري(٣/٥٧٣).

[4] الحجرات(٩).

چاوپۆشی لێی کرد، بەڵام ئێوە پێتان ناخۆش بوو کە لێی خۆش بوو. دەربارەی عەلیش، کوڕی مامی پێغەمبەری خودا بووە(ﷺ) زاوایشی بووە، بە دەستی هێمای کردو، دەڵێت: ئەمەیش ماڵەکەیەتی لەوێدا دەیبینن[1].

﴿الشَّهۡرُ الۡحَرَامُ بِالشَّهۡرِ الۡحَرَامِ وَالۡحُرُمَٰتُ قِصَاصٞۚ فَمَنِ اعۡتَدَىٰ عَلَيۡكُمۡ فَاعۡتَدُواْ عَلَيۡهِ بِمِثۡلِ مَا اعۡتَدَىٰ عَلَيۡكُمۡۚ وَاتَّقُواْ اللَّهَ وَاعۡلَمُوٓاْ أَنَّ اللَّهَ مَعَ الۡمُتَّقِينَ ١٩٤﴾

## قەدەغە کردنی شەڕ کردن لە مانگە حەرامەکاندا مەگین کاتێ دوژمن دەس پێشخەری تێدابکا

﴿الشَّهۡرُ الۡحَرَامُ بِالشَّهۡرِ الۡحَرَامِ وَالۡحُرُمَٰتُ قِصَاصٞ﴾ مانگی شەڕ بس بەرانبەر بە مانگی شەڕ بس، شکاندنی هەر ڕێزێکیشی تۆڵەی هەیە. عیکرمە دەڵێت: لە ئیبنوعەبباس‌و زەحاك‌و سوودی‌و قەتادەو موقسیم‌و ڕەبیعی کوڕی ئەنەس‌و عەتاو کەسانی تریشە: کاتێ کە پێغەمبەری خودا(ﷺ) چوو بە نیازی عومرە لە ساڵی شەشی کۆچیدا، بت پەرستان نەیان هێشت بچێتە ناو مەککە، بوونە ڕێگری خۆشی‌و ئەو موسوڵمانانەشی لەگەڵی بوون. لە مانگی زیلقاعدەدا(ذي القعدة) کە یەکێك بوو لە مانگە حەرامەکان. هەتا ڕێکەوت لەگەڵ بت پەرستەکان ساڵی داهاتووە بێنەوەو بچنە ناو مەککە، پێغەمبەری خودا لە ساڵی دوایدا خۆیی‌و ئەو موسوڵمانانەی لەگەڵی بوون چوونە ناوی،خودا هەقی لێکردنەوەو ئەم ئایەتە هاتە خوارەوە ﴿الشَّهۡرُ الۡحَرَامُ بِالشَّهۡرِ الۡحَرَامِ وَالۡحُرُمَٰتُ قِصَاصٞ﴾ مانگی شەڕە بس بەرانبەر مانگی شەڕبس، شکاندنی هەر ڕێزێکیشی تۆڵەی هەیە[2]. ئیمامی ئەحمەد ڕیوایەتی کردوە لە جابیری کوڕی عەبدوڵڵاوە دەڵێت: پێغەمبەری خودا لە مانگەکانی شەڕ بەسدا غەزای نەدەکرد مەگین کاتێ پەلامار بدرایە جاغەزای دەکرد، کاتێ کە مانگە حەرەمەکان دەهاتن، دەمایەوە هەتا ئەو مانگانە بەسەر دەچوو، (ئەمە سەنەدێکی سەحیحە)[3]. هەر بۆیە کاتێ کە پێغەمبەری خودا کە لە حودەیبیە مانەوەو هەواڵی کوژرانی عوسمانیان درایە، کە پێغەمبەر(ﷺ) بە نامەیەکەوە ناردی بۆ لای بت پەرستەکان، پەیمانی لە هاوەڵەکانی وەرگرت کە هەزارو چوارسەد کەس بوون لە ژێر درەختەکەدا لەسەر شەڕ کردن لەگەڵ بت پەرستەکاندا. کاتێ هەواڵیان پێدا نەکوژراوە، وازی لەو شەڕە هێنا، ڕازی بوو بە ڕێککەوتن‌و وتووێژ کردن، ئەوەبوو کرا. هەر بەو شێوەیەش کاتێ لە شەڕی( هەوازن) بووەوە لە ڕۆژی حونەیندا، خۆی ئامادەکرد بۆ(تایف) بۆیان، ئەوەی گەڕی‌و دەورەی دان‌و چونە مانگی زولقاعدە، بە مەنجەنیق

---

[1] فتح الباري(٨/٣٢).

[2] الطبري(٣/٥٧٥-٥٧٦-٥٧٧-٥٧٩).

[3] أحمد(٣/٣٤٥)، سەحیحە.

دەورەی گرتن، هەتا چل ڕۆژی تەواو بەردەوام بوو لەسەریان[1] وەك لە هەردوو سەحیحەکەدا هاتووە لە ئەنەسەوە دەڵێت: کاتێ کە کوشتارێکی زۆر کرا لە هاوەڵەکانی، وازی لێ هێناو ئازادی نەکرد. پاشان بەرەو دوا گەڕایەوە بۆ مەککە لە جەعرانە(الجعرانة) عەمرەی بەستو هەر لەوێشدا تالانی حونەینی دابەش کرد، عومرەکەیشی هەر لە مانگی زولقاعدەدا بوو لە ساڵی هەشتەمی کۆچیدا.[2] پاشان خودای گەورە ئەفەرموێت: ﴿فَمَنِ ٱعۡتَدَىٰ عَلَيۡكُمۡ فَٱعۡتَدُواْ عَلَيۡهِ بِمِثۡلِ مَا ٱعۡتَدَىٰ عَلَيۡكُمۡ﴾ سا هەرکەسێ دەسدرێژی لە ئێوە کرد، ئێوەش هەر بە ئەندازەی ئەو دەسدرێژی بکەنەوە. خودای مەزن فەرمانی داوە بە دادگەری تەنانەت لەگەڵ بتپەرستانیش. وەك ئەفەرموێت: ﴿وَإِنۡ عَاقَبۡتُمۡ فَعَاقِبُواْ بِمِثۡلِ مَا عُوقِبۡتُم بِهِۦ﴾[3] ئەگەر تۆڵە دەسێننەوە،ئەوە بە ئەندازەی ئەو ستەمەی دژتان کراوە تۆڵە بکەنەوە. پاشان لێرەدا ئەفەرموێت: ﴿وَٱتَّقُواْ ٱللَّهَ وَٱعۡلَمُوٓاْ أَنَّ ٱللَّهَ مَعَ ٱلۡمُتَّقِينَ﴾ ترستان لە خودا هەبێ، بزانن خوا لەگەڵ خۆ پارێزانە. فەرمانی پێداون کە هەر گوێڕایەڵی فەرمانی خودا بن و لەو بترسن، ئاگاداریشی کردوون کە خودا یارمەتی ئەو کەسانە ئەدا کە لێی دەترسن و هاوکاریان دەکات لە دنیاو لە ڕۆژی دوایشدا.

﴿وَأَنفِقُواْ فِي سَبِيلِ ٱللَّهِ وَلَا تُلۡقُواْ بِأَيۡدِيكُمۡ إِلَى ٱلتَّهۡلُكَةِ وَأَحۡسِنُوٓاْ إِنَّ ٱللَّهَ يُحِبُّ ٱلۡمُحۡسِنِينَ ﴿١٩٥﴾﴾

### فەرمان بە بەخشینی ماڵ لە ڕێی خوادا

﴿وَأَنفِقُواْ فِي سَبِيلِ ٱللَّهِ وَلَا تُلۡقُواْ بِأَيۡدِيكُمۡ إِلَى ٱلتَّهۡلُكَةِ﴾ ماڵی خۆتان تا دەتوانن لە ڕێی خوادا ببەخشن، خۆتان تووشی بەڵای بە دەستی خۆتان. مەکەن بوخاری ڕیوایەتی کردوە لە حوزەیفەوە، دەڵێت: ئەم ئایەتە لەسەر ماڵبەخشین هاتۆتە خوارەوە.[4] ئیبنوئەبی حاتەمیش هەر بەم جۆرە ڕیوایەتی کردوە دەڵێت: هەر وایش ڕیوایەت کراوە لە ئیبنوعەبباس و موجاهیدو عیکرمەو سەعیدی کوڕی جوبەیرو عەتاو زەححاك و حەسەن و قەتادەو سوودیو موقاتیلی کوڕی حەیانەوە. لەیسی کوڕی سەعد دەڵێت: لە یەزیدی کوڕی ئەبوحەبیبەوە لە ئەسلەمی کوڕی عیمرانەوە، دەڵێت: پیاوێ لە کۆچەریەکان پەلاماری ڕیزی دوژمنی دا لە قوستەنتەنیەو کەلێنێکی تێکرد(خَرَقَهُ) ئەبوئەیوبی ئەنساریمان لەگەڵا بوو، خەڵکی وتیان: بە دەستی خۆی، خۆی تووشی بەڵا کرد. ئەبوئەیوب دەڵێت: ئێمە باشتر لەم ئایەتە تێدەگەین، ئەم ئایەتە لەسەر ئێمە هاتۆتە خوارەوە، لە خزمەت پێغەمبەری خوادا بووین(ﷺ) زۆر ڕووداومان بە چاوی خۆمان بینی لەگەڵیداو یارمەتیماندا، هەتا ئیسلام بڵاو بووەوەو سەرکەوتنی

---

[1] چل ڕۆژی تەواو کرد لە ڕوداوی ڕۆژی حونەینەوە هەتا ڕۆژی گەڕانەوەی لە جەعرانەوە بۆ مەدینە.

[2] فتح الباري(٣/٧٠١)، مسلم(٢/٩١٦).

[3] النحل(١٢٦).

[4] فتح الباري(٨/٣٣).

بەدەستهێنا. ئێمەی ئەنسارییەکان کۆبوینەوەو وتمان: خودای مەزن ڕێزی لە ئێمە ناو لە خزمەت پێغەمبەرەکەیدا بووین‌و(ﷺ) خودا سەری خست هەتا ئیسلام بڵاوەی کردو خەڵکێکی زۆر موسوڵمان بوون. ئێمە ڕێزو قەدری پێغەمبەرمان(ﷺ) دا بەسەر کەس‌و ماڵ‌و منداڵماندا، ئەوا شەڕیش خەریکە نامێنێ. سا ئیتر با بگەڕێینەوە ناو ماڵ‌و منداڵمان‌و لەگەڵیاندا بمێنینەوەو ژیان بەسەر بەرین. خودای گەورە ئەم ئایەتەی لەسەر ناردینە خوارەوە کە ئەفەرموێت: ﴿وَأَنفِقُواْ فِي سَبِيلِ ٱللَّهِ وَلَا تُلۡقُواْ بِأَيۡدِيكُمۡ إِلَى ٱلتَّهۡلُكَةِ﴾ ماڵی خۆتان تا دەتوانن لە ڕێی خوادا ببەخشن بە دەستی خۆتان خۆتان تووشی بەڵا مەکەن. بە فەتەرات چوون مانەوەیە لەناو ماڵ‌و منداڵداو واز هێنانە لە جیهاد کردن. ئەبوداوودو تیرمیزی‌و نەسائی‌و عەبدی کوڕی حومەیدیش لە تەفسیرەکەیدا هێناویەتی. ئیبنوئەبی حاتەم و ئیبنو جەریر و ئیبنو مەردەوەیهی و حافیز ئەبو یەعلا لە موسنەدەکەیدا و ئیبنوحەبان لە سەحیحەکەیداو حاکیم لە موستەدرەکەکەیدا ڕیوایەتیان کردوە.[1] تیرمیزی دەڵێت: فەرموودەیەکی حەسەنی سەحیحی غەریبە، حاکیم دەڵێت لەسەر مەرجی بوخاری‌و موسلیم بەڵام ئەوان نەیانهێناوە. وتەی ئەبوداوود لە ئەسلەمی کوڕی عیمرانەوە، دەڵێت: ئێمە لە قوستەنتەینە(القسطنطينة) بووین: عوقبەی کوڕی عامیر سەرپەرشتی خەڵکی میسری ئەکرد، وە بەسەر خەڵکی شامیشەوە پیاوێك بوو(ناوی خوزالەی کوڕی عوبەید بوو)، خەڵکێکی زۆر لە شارەکە چوونە دەرەوە، ئێمەش ڕیزمان بەست بۆیان، پیاوێکی موسوڵمان پەلاماری دان‌و چووە ناویان‌و پاشان گەڕایەوە بۆ لامان. خەڵکی دەستیان کردە هاوار کردن لێی‌و وتیان: (سبحان الله) بە دەستی خۆی، خۆی تووشی بەڵا کرد. ئەبوئەیوب دەڵێت: ئەی خەڵکینە ئێوە لە خۆتانەوە مانای ئەم ئایەتە دەکەن‌و ئەوە ماناکەی نیە. بەڕاستی ئەم ئایەتە لەسەر ئێمەی ئەنسارییەکان هاتۆتە خوارەوە. ئێمە کاتێ کە خودای گەورە ئاینەکەی سەرخست‌و یارمەتیدەری زۆر بوو، لە نێوان خۆماندا وتمان: ئەگەر ئیتر بچینەوە ناو ماڵ منداڵمان لەگەڵیان ژیان بەرینە سەر کارێکی خراپ نیە، خودای مەزن ئەم ئایەتەی ناردە خوارەوە.[2] ئەبوبەکری کوڕی عەیاش لە ئیبنوئیسحاقی سەبیعیەوە(السَّبيعي) دەڵێت: پیاوێ دەڵێت بە بەرائی کوڕی عازیب: ئەگەر پەلاماری دوژمن بدەم خۆم بە تەنیاو کوشتمیان، ئا یان من بە دەستی خۆم، خۆم تووشی بەڵا کردوە؟ دەڵێت: نەخێر، خودای مەزن فەرموویەتی بە پێغەمبەرەکەی(ﷺ): ﴿فَقَٰتِلۡ فِي سَبِيلِ ٱللَّهِ لَا تُكَلَّفُ إِلَّا نَفۡسَكَ﴾[3] تۆ لەسەرتە لە

---

[1] تحفة الاحوذي(٨/٣١١)، النسائي في الكبرى(٦/٢٩٩)، إبن أبي حاتم غ: (١/٤٢٤)، الطبري(٣/٥٩٠)، صحيح ابن حبان(٧/١٠٥)، الحاكم(٢/٧٧٥)، سەحیحە.

[2] أبوداود(٣/٢٧).

[3] النساء(٨٤).

ڕێی خودا بچیتە غەزاو تۆ هەر ئەرکی خۆت لەسەرە. بێگومان ئەو ئایەتە لەسەر ماڵ بەخشین هاتۆتە خوارەوە. ئیبنومەردەوەیهی ڕیوایەتی کردوە. حاکمیش ڕیوایەتی کردوە، سەوریو قەیسی کوڕی ڕەبیع ڕیوایەتیان کردوە لە ئەبوئیسحاقەوە لە بەرائەوە کە باسی کردوە دوای ئەوە وتویەتی: ﴿لَا تُكَلَّفُ إِلَّا نَفْسَكَ﴾ بەڵام تووشی بەلا بوون ئەوەیە کەسێ خۆی تووشی گوناه بکاو تەوبە نەکات ئەوە بە دەستێ خۆی، تووشی بەلا کردنە. عەتا دەڵێت لە ئیبنوعەبباسەوە لەم ئایەتەدا ﴿وَأَنفِقُوا فِي سَبِيلِ اللَّهِ وَلَا تُلْقُوا بِأَيْدِيكُمْ إِلَى التَّهْلُكَةِ﴾ ماڵی خۆتان تا دەتوانن لە ڕێی خوادا ببەخشن، خۆتان بە فەتارەت مەدەن، ئەنەس دەڵێت: ئەم ئایەتە دەربارەی جەنگ نەهاتۆتە خوارەوە. بەڵکو لە بارەی ماڵ بەخشینەوە بووە. واتە: ئەوەندە دەستت بگریتەوە لە ماڵ بەخشین لە ڕێی خودا خۆت تووشی بەلا بکەی، وا مەکە. مانای ئایەتەکە ئەوەیە فەرمان دەکات بە ماڵ بەخشین لە ڕێی خوادا بە هەر شێوەیەك مەردم لە خوداوە نزیك بخاتەوەو ملکەچی فەرمانی بن، بەتایبەتی ماڵ بەخشین بۆ جیهاد کردنی دژی دوژمنانی خودا. خەرج کردنی لەوشوێنەدا کە موسوڵمانان بەهێز دەکات بەرانبەر دوژمنەکانیان، هەواڵیشە دەربارەی ئەوانە کە ماڵ نابەخشن لە ڕێی خوادا بە تووشی بەلا بوونو لەناوچوونیان. پاشان فەرمان دەکات بە چاکە کردن کە بەرزترین پلەی گوێڕایەڵیەو خواناسیە: ﴿وَأَحْسِنُوا إِنَّ اللَّهَ يُحِبُّ الْمُحْسِنِينَ﴾ چاکە بکەن، خودا ئاکار چاکی خۆش دەوێت.

﴿وَأَتِمُّوا الْحَجَّ وَالْعُمْرَةَ لِلَّهِ فَإِنْ أُحْصِرْتُمْ فَمَا اسْتَيْسَرَ مِنَ الْهَدْيِ وَلَا تَحْلِقُوا رُءُوسَكُمْ حَتَّى يَبْلُغَ الْهَدْيُ مَحِلَّهُ فَمَن كَانَ مِنكُم مَّرِيضًا أَوْ بِهِ أَذًى مِّن رَّأْسِهِ فَفِدْيَةٌ مِّن صِيَامٍ أَوْ صَدَقَةٍ أَوْ نُسُكٍ فَإِذَا أَمِنتُمْ فَمَن تَمَتَّعَ بِالْعُمْرَةِ إِلَى الْحَجِّ فَمَا اسْتَيْسَرَ مِنَ الْهَدْيِ فَمَن لَّمْ يَجِدْ فَصِيَامُ ثَلَاثَةِ أَيَّامٍ فِي الْحَجِّ وَسَبْعَةٍ إِذَا رَجَعْتُمْ تِلْكَ عَشَرَةٌ كَامِلَةٌ ذَٰلِكَ لِمَن لَّمْ يَكُنْ أَهْلُهُ حَاضِرِي الْمَسْجِدِ الْحَرَامِ وَاتَّقُوا اللَّهَ وَاعْلَمُوا أَنَّ اللَّهَ شَدِيدُ الْعِقَابِ ﴿١٩٦﴾﴾

### فەرماندان بە بەجێهێنانی حەجو عەمرە بە تەواوی

﴿وَأَتِمُّوا الْحَجَّ وَالْعُمْرَةَ لِلَّهِ﴾ حەجو عەمرە هەر بۆ خودا بە تەواوی بەجێ بێنن. کاتێ خودای مەزن باسی حوکمەکانی ڕۆژوو جیهادی کرد، پاشان دێتەسەر باسو ڕوونکردنەوەی دروشمەکانی حەجو فەرمان ئەدات کە حەجو عەمرە هەر بە تەواوی بۆ خودا بکرێ، لە دەقەکەوە وا دیارە هەڵسانە بە جێبەجێ کردنی کارەکانی حەجو عەمرە بە ڕێكو پێکیو بێ کەمو کوڕی ئەفەرموێت: ﴿فَإِنْ أُحْصِرْتُمْ﴾ ئەگەر هەر ڕێگەشیان نەدان. واتە: ئەگەر ڕێگریتان لێ کرا کە بگەنە ماڵی خوداو حەجو عومرەتان لێ قەدەغە کرا. هەر بۆیە زانایان هاوڕان کە هەڵسان بە جێبەجێ کردنی حەجو عومرە پێویستە. مەکحول

دەڵێت: تەواو کردنیان: دەست پێکردنیان لە شوێنی دیاریکراوی خۆیدا(من المیقات)[1]. عەبدورەزاق دەڵێت: موعەمەری هەواڵی پێداوین لە زوهریەوە، دەڵێت: پێمان گەیشتوە لە عومەرەوە کە لەم ئایەتەدا دەڵێت: ﴿وَأَتِمُّوا الْحَجَّ وَالْعُمْرَةَ لِلَّهِ﴾ حەج و عومرە هەر بۆ خودا بە تەواوی بەجێ بێنن. تەواو کردنیشیان ئەوەیە هەر یەکێکیان بە تەنیاو جیا لەوی تر دەستی پێ بکرێت و عەمرە لە مانگەکانی ترا بکرێت جگە مانگی حەج، چونکە خودای مەزن ئەفەرموێت: ﴿الْحَجُّ أَشْهُرٌ مَّعْلُومَاتٌ﴾[2] کاتی حەج لە چەند لە چەند مانگێکی دیاری کراودایە[3]. سوودی دەڵێت: ﴿وَأَتِمُّوا الْحَجَّ وَالْعُمْرَةَ﴾ واتە هەڵسن بە جێبەجێ کردنی حەج و عەمرە[4] قەتادە دەڵێت: لە زورارەوە لە ئیبنوعەبباسەوە کە وتویەتی: حەج عەرەفەیە، عەمرە تەوافە[5]. هەر بەو جۆرە ئەعمەش ڕیوایەتی کردوە لە عەلقەمەوە لەم دەقەدا کە خودای گەورە ئەفەرموێت: ﴿وَأَتِمُّوا الْحَجَّ وَالْعُمْرَةَ لِلَّهِ﴾ دەڵێت: ئەمە خوێندنەوەی عەبدوڵلایە (و أتموا الحج و العمرة الى البيت) حەج و عومرە هەر بۆ خودا بە تەواوی بەجێ بێنن هەتا ماڵی خودا(الى البيت) بە عەمرەوە لە بەیت دەرمەچن. ئیبراهیم دەڵێت: ئەمەم باس کرد بۆ سەعیدی کوڕی جوبەیر، ئەویش دەڵێت: هەروایە ئیبنوعەبباسیش هەر وای وتوە[6]. سوفیانی کوڕی ئەعمەش دەڵێت: لە ئیبراهیمەوە لە عەلقەمەوە دەڵێت: هەڵسن بە بەجێهێنانی حەج و عەمرە هەتا بەیت(البيت)[7] سەوریش هەر وای وتوە لە ئیبراهیمەوە لە مەنسورەوە لە ئیبراهیمەوە کە وا خوێندویەتیەوە: (أقيموا الحج و العُمرةَ الى البيت).

**کاتێ ئیحرام پۆش ڕێی لێ گیرا لە ڕێگەدا با ئاژەڵەکەی سەر بڕێ و سەری بتاشێ و ئیحرامەکەی بشکێنێ**

﴿فَإِنْ أُحْصِرْتُمْ فَمَا اسْتَيْسَرَ مِنَ الْهَدْيِ﴾ ئەگەر هەر ڕێگەشیان نەدان، ئەوسا چەندێ بۆتان کرا ئاژەڵ بکەنە قوربانی. وتویانە ئەم ئایەتە لە شەشی کۆچیدا هاتۆتە خوارەوە. واتە: لە ساڵی حودەیبیەدا، کاتێ کە موشریکەکان بوونە ڕێگر کە پێغەمبەری خودا(ﷺ) بچێتە مەککە، خودای مەزن سورەتی فەتحی بە یەکجاری ناردە خوارەوە، ئاگاداری کردن ئەو قوربانیانەی پێیانە سەریان ببڕن کە حەفتا

---

[1] إبن أبي حاتم غ: (١/٤٣٧).
[2] البقرة(١٩٧).
[3] إبن أبي حاتم غ: (١/٤٣٧).
[4] الطبري(٤/١٢).
[5] إبن أبي حاتم غ: (١/٤٣٩).
[6] الطبري(٤/٧).
[7] الطبري(٤/٧).

بودنه(بدنة) بوو، سەریشیان بتاشن‌و ئیحرامەکەشیان بشکێنن. ئا لەو کاتەدا پێغەمبەر(ﷺ) فەرمانی پێدان کە سەریان بتاشن‌و ئیحرام بشکێنن. ئەیان کرد چاوەڕوانی( سخی)بوون، هەتا پێغەمبەر(ﷺ) چووە دەرەوەو سەری خۆی تاشی‌و خەڵکەکەیش سەریان تاشی. هەندێکی سەری تاشی‌و هەندێکی سەری کورت کردەوە. هەر بۆیە پێغەمبەر(ﷺ) فەرمووی: (ڕەحمەتی خوا لەوانەی سەریان تاشی) وتیان: ئەی ئەوانەی کورتیان کردەوە ئەی پێغەمبەری خودا(ﷺ)؟ لە سێهەم جاردا فەرمووی: (ئەوانەیش کورتیان کردەوە)[1] لەو قوربانییەدا حەوت کەس دەبوون بەشداردەبوون لە یەك بودنەدا، ژمارەیان هەزارو چوارسەد کەس بوو. شوێنەکەیان لە حودەیبییەدا بوو لە دەرەوەی حەرەمی مەککە. دەشڵێن لە لایەکی حەرەمی مەککەوە بوون والله أعلم. ئەم ڕێگرتنە گشتگیرترە لە نەخۆشی‌و درم‌و پێ لێ تێکچوون وێنەی ئەمانە. ئیمامی ئەحمەد ڕیوایەتی کردوە لە حەججاجی کوڕی عەمری ئەنسارییەوە، دەڵێت: بیستم لە پێغەمبەری خودا(ﷺ) ئەیفەرموو: (هەرکەسێ شوێنێکی شکا یان شەل‌و گێڕ بوو، ئەوە ئیحرامەکەی دەشکێنێ‌و حەجێکی تری لەسەرە). دەڵێت: ئەوەم باس کرد بۆ ئیبنوعەبباس‌و ئەبوهورەیرە وتیان: ڕاستی کردوە[2] خاوەنی چوار کتێبەکە هێناویانە[3] لە ڕیوایەتێکی ئەبوداوودو ئیبنوماجەدا هاتوە: (کەسێ شەل بوو یان شوێنێکی شکا یان نەخۆش کەوت)[4] ئیبنوئەبی حاتەمیش ڕیوایەتی کردوە[5] پاشان دەڵێت: ڕیوایەت کراوە لە ئیبنومەسعودو ئیبنوزوبەیرو عەلقەمەوەو سەعیدی کوڕی موسەیب‌و عوروەی کوڕی زوبەیرو موجاهیدو نەخەعی‌و عەتاو موقاتیلی کوڕی حەیانەوە کە وتویانە: گیردان(الاحصار) لەبەر درم‌و یان نەخۆشی یان شکان[6]، سەوری دەڵێت: گیر خواردن بەهۆی هەر شتێکەوە بێت ئازاری دابێت[7]. لە هەردوو سەحیحەکەدا هاتووە لە عائیشەوە کە پێغەمبەری خودا(ﷺ) چووە لای زەباعەی کچی زوبەیری کوڕی عەبدولموتەلیب دەڵێت: ئەی پێغەمبەری خودا(ﷺ) من ئافرەتێکم ناساغم، دەشمەوێ حەج بکەم، فەرمووی: (حەج بکە، بەلاَم مەرجی بگرە شوێنی ئیحرامەکەم ئەو شوێنەیە کە پەکم دەکەوێ)[8]، بەپێی ئەم فەرموودەیە مەرج دانان لە حەجدا

---

[1] مسلم(٢/٩٤٦).

[2] أحمد(٣/٤٥٠)، سەحیحە.

[3] تحفة الاحوذي(٤/٨)، النسائي(٥/١٩٨)، سەحیحە.

[4] أبوداود(٢/٤٣٤)، إبن ماجة(٢/١٠٢٨).

[5] إبن أبي حاتم غ: (١/٤٤٤).

[6] إبن أبي حاتم غ: (١/٤٤٥).

[7] إبن أبي حاتم غ: (١/٤٤٥).

[8] فتح الباري(٩/٣٤). موسلمیش ڕیوایەتی کردوە لە ئیبنوعەبباسەوە هەر بەو جۆرە.

دروستە. خودای مەزن ئەفەرموێت: ﴿فَمَا اسْتَيْسَرَ مِنَ الْهَدْيِ﴾ ئەوسا چەندێ بۆتان کرا ئاژەڵ بکەنە قوربانی. ئیمامی مالیك ڕیوایەتی کردوە لە عەلی کوڕی ئەبوتالیبەوە کە دەیوت: ﴿فَمَا اسْتَيْسَرَ مِنَ الْهَدْيِ﴾ واتە: مەڕێ.[1] ئیبنوعەبباس دەڵێت: ئاژەڵ(الهدی) لە هەشتە نێرو مێکە، لە وشترو گاو مانگاو بزنو مەڕ.[2] عەبدوڕەزاق ڕیوایەتی کردوە لە ئیبنوعەبباسەوە لەم دەقەدا ﴿فَمَا اسْتَيْسَرَ مِنَ الْهَدْيِ﴾ بە پێی تواناو بۆ لوان.[3] عەوفی لە ئیبنوعەبباسەوە دەڵێت: ئەگەر توانای هەبوو وشترێ، ئەگەر نەیتوانی مانگایە، ئەگەر نەیتوانی مەڕێ.[4] هیشام لە عوروەوە لە باوکیەوە دەڵێت: ﴿فَمَا اسْتَيْسَرَ مِنَ الْهَدْيِ﴾ ئەمە بۆ ڕێگە پێدانە بۆ کەسێ کە چەندە دەتوانێو بۆی دەلوێت. بەڵگەیش لەسەر دروستی سەربڕینی مەڕێك لە کاتی ڕێگریدا(الاحصار) خودا واجبی کردوە کە ئاژەڵ سەربڕێت بە پێی تواناو بۆ لوان، ئاژەڵەکانیش بریتین لە( وشترو ڕەشەوڵاغو مەڕو بزن،) وەك زاناو ڕاڤەکەی قورئان ئامۆزای پێغەمبەری خودا(ﷺ) ئیبنوعەبباس وتویەتیو لە هەردوو سەحیحەکەیشدا لە عائیشەی دایکی موسوڵمانانەوە هاتوە(ڕەزای خوای لێ بێ) دەڵێت: پێغەمبەر(ﷺ) جارێك مەڕێکی کردە قوربانی،[5] خودای مەزن ئەفەرموێت: ﴿وَلَا تَحْلِقُوا رُءُوسَكُمْ حَتَّىٰ يَبْلُغَ الْهَدْيُ مَحِلَّهُ﴾ هەتا ئاژەڵی قوربانی نەگاتە جێی دیاری کراو، سەر مەتاشن. ئەم دەقە مەعتوفە لەسەر ﴿وَأَتِمُّوا الْحَجَّ وَالْعُمْرَةَ لِلَّهِ﴾ مەعتوف نیە بەسەر ﴿فَإِنْ أُحْصِرْتُمْ فَمَا اسْتَيْسَرَ مِنَ الْهَدْيِ﴾ وەك ئیبنوجەریر وای زانیوە. چونکە پێغەمبەرو(ﷺ) هاوەڵەکانی لە ساڵی حودەیبیەدا کاتێ موشریکەکانی قورەیش ڕێیان نەدان بچنە ناو حەرەم، سەریان تاشیو قوربانیان سەر بڕی لە دەرەوەی حەرەم. بەڵام لە کاتی دڵنیایداو چوونە ناو حەرەم. سەرتاشین دروس نیە ﴿حَتَّىٰ يَبْلُغَ الْهَدْيُ مَحِلَّهُ﴾ هەتا ئاژەڵی قوربانی نەگاتە شوێنی دیاری کراو، هەتا ئەو کەسەی خەریکی حەجو عەمرەیە لە کارەکانی دەبێتەوە، ئەگەر حەجو عەمرەی پێکەوە گرێ دابوو، یان یەکێکیانی کرد بوو بە تەنیا،یان بەخوایش(متمتعاً) کردبووی. وەك لە هەردوو سەحیحەکەدا هاتووە لە حەفسەوە کە دەڵێت: ئەی پێغەمبەری خودا(ﷺ) ئەو خەڵکە چی بکەن کە عەمرەیان شکاندو تۆ عەمرەکەت

---

[1] الوطأ(١/٣٨٥).

[2] إبن أبي حاتم غ: (١/٤٥٠).

[3] إبن أبي حاتم غ: (١/٤٥١).

[4] الطبري(٤/٣٠).

[5] فتح الباري(٣/٦٣٩)، مسلم(٢/٩٥٨).

نەشکاندوە؟ فەرمووی: (من سەرم چەور کردوەو قوربانیەکەم هێناوە، ئیحرام ناشکێنم هەتا سەری دەبڕم)[1].

## هەر کەسێ سەری تاشی لە ئیحرامدا فیدیەی لەسەر واجب دەبێ

﴿فَمَن كَانَ مِنكُم مَّرِيضًا أَوْ بِهِۦٓ أَذًى مِّن رَّأْسِهِۦ فَفِدْيَةٌ مِّن صِيَامٍ أَوْ صَدَقَةٍ أَوْ نُسُكٍ﴾ کێش لە ئێوە نەخۆش بوو یان ئازارێك لە سەریدا بوو، لە بارتەقایدا بەڕۆژوو بێ یان خێرێك ببەخشێتەوە یان ئاژەڵێك بکاتە خێر هەر لەوێدا، بوخاری ڕیوایەتی کردوەلە عەبدوڕەحمانی کوڕی ئەسبەهانیەوە کە بیستویەتی لە عەبدواڵلای کوڕی مەعقیلەوە دەڵێت: دانیشتم لەلای کەعبی کوڕی عەجرەوە لەم مزگەوتەدا(یانی مزگەوتی کوفە) پرسیارم لێکرد دەربارەی فیدیەی ڕۆژوو، وتی هەڵیان گرتمو هێنامیان بۆ لای پێغەمبەری خودا(ﷺ)،ئەسپێ بە دەمو چاومدا بەڵاوەی کردبوو، دەهاتو دەچوو، فەرمووی: (نەمزانی ئەوەندە ناڕەحەتی کردوی، توانای مەڕێکت نیە سەری بڕی؟) وتم: نەخێر، فەرمووی: (سێ ڕۆژ بە ڕۆژو بە، یان خواردنی شەش هەژار بدە،بۆ هەر هەژارێ نیو(ضاع) خواردن، پاشان سەرت بتاشە)، ئەم ئایەتە لە سەر من هاتە خوارەوە، وە بۆ ئێوەیشە بە گشتی.[2] ئیمامی ئەحمەد ڕیوایەتی کردوە لە کەعبی کوڕی عوجرەوە دەڵێت: پێغەمبەری خودا(ﷺ) هاتە لام لەژێر قازانێکا ئاگرم هەڵدەگیرساند، ئەسپێ دەمو چاومی داپۆشیبوو یان دەڵێت: بەسەر برۆمدا دەچوو، فەرمووی: (ئەسپێ ئازاری سەرت ئەدەن؟) وتم: بەڵێ، فەرموی: (بیتاشەو سێ ڕۆژ ڕۆژوو، بگرە یان خواردنی شەش هەژار بدە، یان ئاژەڵێ سەربڕە). ئەیوب دەڵێت: نازانم بە کامیان دەستی پێکرد[3] دیارە قورئانی پیرۆزیش ئاسانکاری کردوە بەپێی توانا ﴿فَفِدْيَةٌ مِّن صِيَامٍ أَوْ صَدَقَةٍ أَوْ نُسُكٍ﴾ لە باتیدا بەڕۆژو وبێ، یان خێریك ببەخشێتەوە، یان ئاژەڵێ بکات بەقوربانیی. کاتێ پێغەمبەر(ﷺ) فەرمانی دا بە عوجرە بەوەو ڕێی نیشاندا بە چاکترو چاکتر، فەرمووی: ئاژەڵێك بکە بەخێر، یان خواردنی شەش هەژار بدە،یان سێ ڕۆژ بەڕۆژووبە، هەر یەکە لەمانە لە شوێنی خۆیدا چاکن سوپاس‌و ستایش بۆ خودای مەزن.

## ڕوونکردنەوەی تەمەتوع( التمتع ) لە حەجدا

خودای مەزن ئەفەرموێت: ﴿فَإِذَآ أَمِنتُمْ فَمَن تَمَتَّعَ بِٱلْعُمْرَةِ إِلَى ٱلْحَجِّ فَمَا ٱسْتَيْسَرَ مِنَ ٱلْهَدْىِ﴾ هەر کاتێ ترستان نما، هەرکەسێ ویستی بەهرە ببا لە عەمرە تا کاتی حەج دێ، هەر چەندێکی لەدەس دێ ئاژەڵ بکاتە قوربانی. واتە: ئەگەر دروشمەکانتان بەجێهێنا، هەر کەسێ ئیحرامی بە عەمرە بەستوە هەتا حەج یان

---

[1] فتح الباري(٣/٤٩٣)، مسلم(٢/٩٠٢).

[2] فتح الباري(٨/٣٤).

[3] أحمد(٤/٢٤١)، سەحیحە.

بۆ هەردووكیانی بەستوە، یان هەر بە تەنیا ئیحرامی بۆ عەمرە بەستوە، یان كاتێ كە عەمرەكەی تەواو كرد، ئیحرام بە حەج ببەستێ، ئەمە پێی دەڵێن(تەمەتوعی تایبەتی) ئەمەش لەلای زانایانی شەریعەت بەناوبانگە، بەڵام (تەمەتوعی گشتی)، هەردوو بەشەكە دەگرێتەوە، وەك لە فەرموودەی سەحیحدا هاتوە كە دەڵێن: پێغەمبەری خودا(ﷺ) تەمەتوعی كردوە(واتە: لە میقاتەوە ئیحرامی بە عەمرە بەستووە) هەندێكی تریش دەڵێن: بە(قارن) واتە: (لە میقاتەوە ئیحرامی بە حەج و عەمرە بەستوە): زانایان هاوڕان كە ئاژەڵی قوربانی ئامادەكرد. خودای مەزن ئەفەرموێت: ﴿فَمَن تَمَتَّعَ بِٱلۡعُمۡرَةِ إِلَى ٱلۡحَجِّ فَمَا ٱسۡتَيۡسَرَ مِنَ ٱلۡهَدۡيِ﴾ ئەو كەسەی بەهرەمەند بوو بە بە جێهێنانی عەمرە تا كاتی حەج، ئەوە چی بۆ كرا لە ئاژەڵ بیكاتە قوربانی. كەمترینیان مەڕێكە. دەشتوانێ مانگایەك سەربڕێت. چونكە پێغەمبەری خودا(ﷺ) مانگایەكی لەبری خێزانەكانی سەربڕی. خێزانەكانی لە(تەمەتوعا) بوون،[1] ئەبو بەكری كوڕی مەردەویهیش ڕیوایەتی كردوە. ئەمە بەڵگەیە لەسەر دروستی تەمەتوع، وەك لە هەردوو سەحیحەكەدا لە عیمرانی كوڕی حوسەینەوە(الحُصَین) هاتووە، دەڵێت: ئایەتی موتعە لە كتێبی خوادا هاتۆتە خوارەوە، ئێمەیش لەگەڵ پێغەمبەری خوادا(ﷺ) كردومانە. قورئان نەهاتۆتە خوارەوە حەرامی بكا، پێغەمبەریش(ﷺ) هەتا كۆچی دوایی كرد،قەدەغەی نەكرد. پیاوێك بە ئارەزووی خۆی قسەیەكی كردوە، كردویەتی. بوخاری دەڵێت: دەڵێن ئەو پیاوە عومەر بووە[2] ئەوەی بوخاری وتویەتی، عومەر ئەو قسەیەی كردوە تەمەتوعی خەڵكی قەدەغە كردوە دەڵێ: ئێمە كار بە وكتێبەی خودا دەكەین كە فەرمویەتی: ﴿وَأَتِمُّواْ ٱلۡحَجَّ وَٱلۡعُمۡرَةَ لِلَّهِ﴾ حەج و عەمرە هەر بۆ خودا بە تەواوی بكەن. یا دیارە عومەر(ڕەزای خوای لێ بێ) قەدەغەی تەمەتوعی نەكردوەو حەرامیشی نەكردوە، بەڵكو لەبەر ئەوە بووە خەڵكی بە زۆری نیەتی حەجو عەمرەیان هێناوە كە هاتوون بۆ حەج كردن بۆ بەیت، وەك عومەر ئامازەی پێكردووە(ڕەزای خوای لێ بێ).

## درێژە ئەو كەسەی تەمەتوعی كردوە ئاژەڵی دەس نەكەوت با سێ ڕۆژ بەڕۆژوو بێت

﴿فَمَن لَّمۡ يَجِدۡ فَصِيَامُ ثَلَٰثَةِ أَيَّامٖ فِي ٱلۡحَجِّ وَسَبۡعَةٍ إِذَا رَجَعۡتُمۡۗ تِلۡكَ عَشَرَةٞ كَامِلَةٞ﴾ ئەگەر دەستیشی نەڕۆیشت، سێ ڕۆژ لە حەج بەڕۆژوو بێ، وەختێ گەڕاشنەوە حەوت ڕۆژ كە تێكڕای دەبێتە دە ڕۆژی تەواو. واتە: كەسێ ئاژەڵی نەبوو سێ ڕۆژ لە كاتی حەجدا بەڕۆژوو بێت. واتە: لە كاتی بەجێهێنانی دروشمەكاندا بەڕۆژوو بێت. ئیبنوعەبباس دەڵێت: ئەگەر توانای سەربڕینی ئاژەڵی نەبوو دەبێ سێ ڕۆژ بەڕۆژوو بێت لە كاتی حەجدا پێش ڕۆژی عەرەفە. خۆ ئەگەر ڕۆژی عەرەفە سێهەم ڕۆژی بوو، ڕۆژوەكەی تەواوە،

---

[1] أبوداود(٢/٣٦٢)، حاكمو زەهەبی بە سەحیحیان داناوە.

[2] فتح الباري(٨/٣٤)، مسلم(٢/٩٠٠).

حەوت ڕۆژیش کاتێ کە گەڕایەوە بۆ ناو کەس و کاری[1] هەروا ئەبوئیسحاقیش ڕیوایەتی کردوە لە وەبرەوە(وَبْرَة) لە ئیبنوعومەرەوە دەڵێت: ڕۆژێ دەگرێت لە ڕۆژی تەرویەدا ڕۆژی کیش لە پێش ڕۆژی تەرویەداو ڕۆژی عەرەفەیش دەگرێ[2]، هەر بەو جۆرە جەعفەری کوڕی موحەممەد ڕیوایەتی کردوە لە باوکیەوە لە عەلیەوە دیسان[3]: ئەگەر نەیگرت یا هەندێکی نەگرت لە پێش جەژندا، دروستە لە ڕۆژەکانی تەشریقدا ئەو ڕۆژوانە بگرێ. لەسەر قسەی عائیشەو ئیبنوعومەر کە لە سەحیحی بوخاریدا هاتوە: لە ڕۆژەکانی تەشریقدا ڕێگە نەدراوە ڕۆژو بگرن،مەگەر بۆ کەسێ توانای سەربڕینی ئاژەڵی نەبێ. سوفیان ڕیوایەتی کردوە لە جەعفەری کوڕی موحەممەدەوە لە باوکیەوە لە عەلیەوە کە وتویەتی: هەر کەسێ ئەو سێ ڕۆژەی لە دەسچوو لە کاتی حەجداو نەیگرت، با لە ڕۆژەکانی تەشریقدا(أيام التشريق) بیانگرێتەوە،[5،4] بەپێی گشتگیری ئایەتەکە وتویانە کە ئەفەرموێ: ﴿فَصِيَامُ ثَلَٰثَةِ أَيَّامٍ فِي ٱلْحَجِّ﴾ سێ ڕۆژ لە حەج بەڕۆژوو بێ. بەڵام ئەوەی موسلیم ڕیوایەتی کردوە لە نوسەیشەی هوزەلیەوە (ڕەزای خوای لێ بێ) دەڵێت: پێغەمبەری خودا(ﷺ) فەرموویەتی: (ڕۆژەکانی تەشریق ڕۆژی خواردن و خواردنەوەو یادکردنی خودای مەزنە)[6] ئەم فەرموودەیە گشتگیرە، بەڵام ڕیوایەتەکەی عائیشەو ئیبنوعومەر تایبەتترە لەوە. خودای مەزن ئەفەرموێت: ﴿وَسَبْعَةٍ إِذَا رَجَعْتُمْ﴾ حەوت ڕۆژیش کاتێ گەڕانەوە.ئەمە دوو بۆچوونی لەسەرە: یەکەم: کاتێ گەڕانەوە ناو جێ و شوێن لای تفاقەکانتان دووەم: کاتێ گەڕانەوە بۆ وڵاتی خۆتان. عەبدوڕەزاق لە سالمەوە ڕیوایەتی کردوە دەڵێت: لە ئیبنوعومەرەم بیستم دەڵێت: ﴿فَصِيَامُ ثَلَٰثَةِ أَيَّامٍ فِي ٱلْحَجِّ وَسَبْعَةٍ إِذَا رَجَعْتُمْ﴾ ئەگەر دەستیشی نەڕۆشت،سێ ڕۆژ لە حەج بەڕۆژوو بێ، حەوت ڕۆژیش کاتێ کە گەڕایەوە ناو کەس و کاری[7]بوخاری ڕیوایەتی کردوە لە سالمی کوڕی عەبدوڵڵاوە کە ئیبنوعومەر دەڵێت: پێغەمبەری خودا(ﷺ) لە حەجی ماڵئاواییدا لە پێشدا بۆ عەمرە ئیحرامی بەست و دوایی بۆ حەج، لە زولحەلیفەوە مەڕێکی کردە فیدیە لەو ئاژەڵەی

---

[1] الطبري(٤/٩٧).

[2] الطبري(٤/٩٥).

[3] الطبري(٤/٩٤).

[4] عوبەیدی کوڕی عومەیری لەیسی(الليثي) عیکرمەو حەسەنی بەسری و عوروەی کوڕی زوبەیریش هەر وا دەڵێن.

[5] الطبري(٤/٩٨-٩٩).

[6] مسلم(٢/٨٠٠).

[7] هەر وایش ڕیوایەت کراوە لە سەعیدی کوڕی جوبەیرو ئەبولعالیەو موجاهیدو عەتاو عیکرمەو حەسەن و قەتادەو زوهری و ڕەبیعی کوڕی ئەنەسەوە[7]

لەگەڵ خۆی هێنا بوو، سەرەتا پێغەمبەر(ﷺ) بە عەمرە دەستی پێکرد، پاشان خەڵکیش لە خزمەت پێغەمبەری خوادا(ﷺ) ئیحرامیان شکاند لە عەمرەوە بۆ حەج. جا هەبوو لەو خەڵکە فیدیەی هێنا بوو، هەیشبوو نەیهێنا بوو، کاتێ پێغەمبەر(ﷺ) گەیشتە مەککە بە خەڵکەکەی فەرموو: (ئەوەتان کە فیدیەی هێناوە ئەوە هیچ شتێك لەو شتانەی لێی حەرام کراوە بۆی حەڵاڵ نابێ هەتا حەجەکەی نەکات. ئەوەیش کە فیدیەی پێ نیە با بچێ تەوافی(بیت)و سەفاو مەروە بکات،. مووی سەری کورت بکاتەوەو ئیحرام بشکێنێ، پاشان ئیحرام ببەستێتەوە بۆ حەجوە لەو بەدوا فیدیەی بدات، ئەوەیش توانای فیدیەی نیە، با سێ ڕۆژ لە حەجدا بەڕۆژوو بێت، حەوتیش کە گەڕایەوە ناو کەسو کاری) فەرموودەکەی بە تەواوی باس کرد[1]، خودای مەزنیش ئەفەرموێت: ﴿تِلْكَ عَشَرَةٌ كَامِلَةٌ﴾ کە تێکڕایی دەبێتە دە ڕۆژی تەواو. وتراوە: ئەم دەقە بۆجەخت لەسەرکردنەوە. وەك عەرەب دەڵێن: بە چاوی خۆم دیمو بە گوێی خۆم بیستمو بە دەستی خۆم نووسیم. خودای مەزنیش ئەفەرموێت: ﴿وَلَا طَائِرٍ يَطِيرُ بِجَنَاحَيْهِ﴾[2] وە هەر مەلێ بە باڵەکانی دەفڕێ.یان ئەفەرموێت: ﴿وَلَا تَخُطُّهُ بِيَمِينِكَ﴾[3] یان بە دەستی خۆت بینوسی.: ﴿وَوَاعَدْنَا مُوسَىٰ ثَلَاثِينَ لَيْلَةً وَأَتْمَمْنَاهَا بِعَشْرٍ فَتَمَّ مِيقَاتُ رَبِّهِ أَرْبَعِينَ لَيْلَةً﴾[4] لەگەڵ مووسا بەڵێنی سی شەوەمان دانا. دەی دیکەشیان بۆ خستە سەر،ئەوسا کاتی دیداری پەروەردگاری بوو بە چل شەوی تەواو.

## خەڵکی مەککە ئیحرام بە عەمرە نابەستێ

﴿ذَٰلِكَ لِمَن لَّمْ يَكُنْ أَهْلُهُ حَاضِرِي الْمَسْجِدِ الْحَرَامِ﴾ ئەم بەهرە بردنەش هەر بۆ کەسێکە خۆی ماڵی لە مەککەدا نەبێ. واتە: ئیحرام بە عەمرە بەستن بۆ خەڵکی مەککە نیە،عەبدوڕەزاق ڕیوایەتی کردوە لە تاوسەوە دەڵێت: موتعە بۆ خەڵکی مەککە نیە، بۆ ئەو کەسەیە کە(خۆی)و کەسو کاری دانیشتوی دەوروبەری(مسجد الحرام) نەبێت. خودای گەورەش هەر وا ئەفەرموێت: ﴿ذَٰلِكَ لِمَن لَّمْ يَكُنْ أَهْلُهُ حَاضِرِي الْمَسْجِدِ الْحَرَامِ﴾ ئەم بەهرەیە بۆ کەسێکە خۆیو ماڵی لە مەککەدا نەبێ. عەبدوڕەزاق دەڵێت: هەواڵم پێدراوە کە ئیبنوعەبباسیش هەر ئەم قسەی تاوسی کردوە[5]، ﴿وَاتَّقُوا اللَّهَ وَاعْلَمُوا أَنَّ اللَّهَ شَدِيدُ الْعِقَابِ﴾

---

[1] ئەم فەرموودەیە لە هەردوو سەحیحەکەدا هاتوە. فتح الباري(٣/٦٣٠)، مسلم(٢/٩٠١).

[2] الانعام(٣٨).

[3] العنكبوت(٤٨).

[4] الاعراف(١٤٢).

[5] الطبري(٤/١١١).

دەبێ لە خودا بترسن، خودا لە تۆڵە سەندنا توندو تیژە. واتە: لەخوا بترسن لەوشتانەدا کە فەرمانتان پێدەکاو لەوانەیش لێی قەدەغە کردوون. تۆڵەیشی زۆر توندە دەرحەق بە ئەوانەی دژی فەرمانەکانی بێ و ئەو کارانە بکات کە حەرامی کردون.

﴿ٱلْحَجُّ أَشْهُرٌ مَّعْلُومَٰتٌ ۚ فَمَن فَرَضَ فِيهِنَّ ٱلْحَجَّ فَلَا رَفَثَ وَلَا فُسُوقَ وَلَا جِدَالَ فِى ٱلْحَجِّ ۗ وَمَا تَفْعَلُوا۟ مِنْ خَيْرٍ يَعْلَمْهُ ٱللَّهُ ۗ وَتَزَوَّدُوا۟ فَإِنَّ خَيْرَ ٱلزَّادِ ٱلتَّقْوَىٰ ۚ وَٱتَّقُونِ يَٰٓأُو۟لِى ٱلْأَلْبَٰبِ ﴿١٩٧﴾﴾

### کەی ئیحرام بۆ حەج دەبەستری؟

﴿ٱلْحَجُّ أَشْهُرٌ مَّعْلُومَٰتٌ﴾ کاتی حەج چەند مانگێکی دیاریکراون. واتە: دروست نیە ئیحرام بەستن لە مانگی خۆیدانەبێت[1]، بەڵگەیش لە سەری دیاریکردنی کاتی حەج لە چەند مانگێکی دیاری کراودا جگە لە مانگەکانی تر لە ساڵدا، نیشانەی ئەوەیە لە مانگەکانی تری پێشدا دروست نیە وەك کاتی دیاری کراوی نوێژەکان. شافیعی ڕیوایەتی کردوە لە ئیبنوعەبباسەوە کە وتویەتی: هیچ کەسێ بۆی نیە ئیحرام بە حەج ببەستێ جگە لە مانگەکانی حەج، لەبەر ئەم دەقە کە خودای مەزن ئەفەرموێت: ﴿ٱلْحَجُّ أَشْهُرٌ مَّعْلُومَٰتٌ﴾ کاتی حەج چەند مانگێکی دیاری کراون[2]. ئیبنوخوزەیمەش ڕیوایەتی کردووە لە ئیبنوعەبباسەوە دەڵێت: ئیحرام بە حەج نابەسترێ لە مانگەکانی حەجدا نەبێ[3] چونکە سوننەتی حەجە کە ئیحرام لە مانگەکانی حەجدا، ببەسترێ(ئەمە سەنەدەکانی سەحیحە)، چونکە قسەی هاوەڵەکانی حوکمی مەرفوعی هەیە لە لای زۆرینەی زانایان، بەتایبەتی قسەی ئیبنوعەبباسیش دەربارەی تەفسیری قورئان، کە ئەو خۆی ڕاڤەکەری قورئانە. لە فەرموودەی مەرفوعدایشدا هاتووە: لە جابیرەوە ڕیوایەت کراوە لە پێغەمبەری خوداوە(ﷺ) کە فەرموویەتی: (بۆ هیچ کەسێ نیە ئیحرام بە حەج ببەستێ جگە لە مانگەکانی حەج)[4]( ئەم فەرموودە سەنەدەکانی خراپ نیە) بەڵام شافیعیو بەیهەقی ڕیوایەتیان کردوە لە چەند ڕێگاوە، لە ئیبنوجورەیجەوە لە ئەبوزوبەیرەوە کە بیستویەتی لە جابیری کوڕی عەبدوڵلا کە پرسیاری لێ کرا: ئایا ئیحرام بە حەج ببەسترێ لە پێش مانگەکانی حەجدا؟ دەڵێت: نەخێر،[5] ئەم فەرمودە(موقوفە) سەحیحترو باشترە لە مەرفوع، چونکە ڕێچکەی

---

[1] ئەمە لە ئیبنوعەبباسو جابیرەوە ڕیوایەت کراوە، عەتاو تاوسو موجاهیدیش هەر وایان وتوە.

[2] الأم(٢/١٣٢).

[3] ابن خزيمة(٤/١٦٢).

[4] إبن أبي شيبة(الجزء المفقود:٣٦١).

[5] الأم(٢/١٣٢)، البيهقي(٤/٣٤٣).

هاوەڵەکانی(مذهب الصحابي) بەهێز تر دەبێ بە قسەی ئیبنوعەبباس لە فەرمودەدا. کە نابێ ئیحرام بە حەج ببەسترێ جگە لە مانگەکانی حەج خۆی،( والله أعلم.)

### مانگەکانی حەج

خودای مەزن ئەفەرموێت: ﴿ٱلْحَجُّ أَشْهُرٌ مَّعْلُومَٰتٌ﴾ کاتی حەج چەند مانگێکی دیاری کراون. بوخاری‌لە لەئیبنوعومەرەوە دەڵێت: مانگەکانی حەج بریتین لە: (شەوال‌و زولقاعدەو دە ڕۆژی زولحەجەیە)[1]. (ئەمە ئەوەیە کە بوخاری بە شێوەی بڕیاردان هێناویەتی ئیبنوجەریریشبە موسولی ڕیوایەتی کردوە لە ئیبنوعومەرەوە ﴿ٱلْحَجُّ أَشْهُرٌ مَّعْلُومَٰتٌ﴾ کاتی حەج چەند ڕۆژێکی دیاری کراون. دەڵێت: ئەو مانگە دیاری کراوانە، (شەوال‌و زولقاعدەو دە ڕۆژی زولحەجەیە) سەنەدەکەی سەحیحە[2]، حاکمیش ڕیوایەتی کردووە لە موستەدرەکەکەیداو دەڵێت: ئەم فەرموودە لەسەر مەرجی بوخاری‌و موسلیمە[3] منیش دەڵێم: ئەم فەرموودە ڕیوایەت کراوە[4]. چونکە ئەوە لە هەندێ لەو ساڵەو ئەو ڕۆژەدا ڕوویداوە. خودای مەزنیش ئەفەرموێت: ﴿فَمَن تَعَجَّلَ فِى يَوْمَيْنِ فَلَآ إِثْمَ عَلَيْهِ﴾[5] هەر کەس دوو ڕۆژی پێش بخا، گوناهی نایەتە سەر. دیارە ئەو کەسە ڕۆژێك‌و نیوەی ڕۆژێك پێشی خستووە[6] پاشان خودای گەورە ئەفەرموێت: ﴿فَمَن فَرَضَ فِيهِنَّ ٱلْحَجَّ﴾ هەر کەسێك لەوانەدا فەرزی حەج بەجێ بێنێ. واتە: ئیحرامی بە حەج بەست، ئەم ئایەتە بەڵگەیە لەسەر بەستنی حەج بە واجبی‌و بەردەوام بوون لەسەری. ئیبنوجەریر دەڵێت: زانایان کۆ دەنگن لەسەر ئەوە کە مەبەست بەم فەرزە لێرەدا واجب بوون‌و پابەند بوونە[7] عەلی کوڕی ئەبوتەلحە دەڵێت لە ئیبنوعەبباسەوە ﴿فَمَن فَرَضَ فِيهِنَّ ٱلْحَجَّ﴾: هەر کەسێ

---

[1] فتح الباري(٣/٤٩٠).

[2] الطبري(٤/١١٦).

[3] الحاكم(٢/٢٧٦).

[4] لە عومەرو عەلی‌و ئیبنومەسعودو عەبدوڵلای کوڕی زوبەیرو ئیبنوعەبباس‌و عەتاو تاوس‌و موجاهیدو ئیبراهیمی نەخەعی‌و شەعبی‌و حەسەن‌و ئیبنوسیرین‌و مەکحول‌و قەتادەو زەححاك‌و ڕەبیعی کوڕی ئەنەس‌و موقاتیلی کوڕی حەیانەوە[4] ئیبنوجەریریش هەر ئەم ڕایەی هەڵبژاردووە، دەڵێت: دروستە وتەی کۆ(الجمع) بەکار بێنی بۆ دوو مانگ‌و سێ یەکی مانگێ بۆ زاڵ کردن(التغليب) وەك عەرەب دەڵێن: ئەم ساڵ چوومە لای‌و ئەمڕۆش چاوم پێی کەوت

[5] البقرة(٢٠٣).

[6] الطبري(٤/١٢٠).

[7] الطبري(٤/١٢١).

ئیحرامی بەست بە حەج یان بە عەمرە. عەتا دەڵێت: (الفرض) یانی: ئیحرام بەستن،[١] ئیبراهیمو زەححاكو كەسانی تریش هەر وایان وتوە[٢].

## قەدەغە كردنی سەرجێیی لە كاتی حەجدا

﴿فَلَا رَفَثَ﴾ توخنی ژنان نەكەون. واتە: هەر كەسێ ئیحرامی بە حەج یا بە عەمرە بەست، نزیكی ژنان نەكەوێتەوە. واتە: سەرجێیی نەكات. وەك خودای مەزن ئەفەرموێت: ﴿أُحِلَّ لَكُمْ لَيْلَةَ ٱلصِّيَامِ ٱلرَّفَثُ إِلَىٰ نِسَآئِكُمْ﴾[٣] سەرجێی ژنان كردنتان لە شەوانی ڕەمەزان بۆتان ڕەوایە. ئەو شتانەشی دەبنە هۆكاری سەرجێیی هەر حەرامە، وەك:ماچ كردنو باوەش پیاكردنو شتی تر. یان باسكردنیشی لەناو ژناندا، ئیبنوجەریر ڕیوایەتی كردوە لە نافیعەوە لە عەبدوڵلای كوڕی عومەرەوە كە دەیوت: (الرفث) واتە سەرجێی كردن. یان باس كردنی سەرجێیی لەلایەن ژنانو پیاوانەوە، ئەگەر بە دەم قسەیان لەو بارەیەوە كرد.[٤] عەتای كوڕی ئەبوڕەباح دەڵێت: (الرفث) واتە سەرجێییو قسە كردن لە بارەیەوە بە شێوەی خراپو نابەجێ[٥] عەمری كوڕی دیناریش هەر وای وتوە، عەتا دەڵێت عەرابەیان(العرابة) پێ ناخۆش بووە، مەبەست پێی ئیشارەت پێدانە(التعریض) ئەوەیش هەر حەرامە،[٦] تاوس دەڵێت: وەك ئەوە كە بڵێیت بە ژن ئەگەر ئیحرامت شكاند سەرجێییت لەگەڵا دەكەم.[٧] ئەبولعالیەش هەر وای وتوە. عەلی كوڕی ئەبوتەلحە لە ئیبنوعەبباسەوە دەڵێت: (الرفث) تێكەڵی ژنانو ماچ كردنو چاو لێ هەڵتەكاندنیو قسەی نابەجێ كردنو هەر قسەیەكی خراپ[٨] ئیبنوعەبباسو ئیبنوعومەر دەڵێن: (الرفث) چوونە لای ژنان[٩].

---

[١] الطبري(١٢٣/٤).

[٢] الطبري(١٢٣/٤).

[٣] البقرة(١٨٧).

[٤] الطبري(١٢٦/٤).

[٥] الطبري(١٢٧/٤).

[٦] الطبري(١٢٨/٤).

[٧] الطبري(١٢٨/٤).

[٨] الطبري(١٢٩/٤).

[٩] . سەعیدی كوڕی جوبەیرو عیكرمەو موجاهیدو ئیبراهیمو ئەبولعالیەو عەتاو مەكحولو عەتای خۆراسانیو عەتای كوڕی یەسارو عەتیەو ئیبراهیمی نەخەعیو ڕەبیعو زوهریو سوودیو مالیكی كوڕی ئەنەسو موقاتیلی كوڕی حەیانوعەبدولكەریمی كوڕی مالیكو حەسەنو قەتادەو زەححاكو كەسانی تریش هەر وایان وتوە

- قەدەغە کردنی بەدکاری

خودای مەزن ئەفەرموێت: ﴿وَلَا فُسُوقَ﴾ لە ڕێگە خودا لادان. میقسەمو کەسانی تریش و لە ئیبنوعەبباسەوەوتوویانە مەبەست پێی سەرپێچیەکانە[1] ئیبنووەهەبی ڕیوایەتی کردوە لە یونسەوە لە نافیعەوە کە عەبدوڵڵای کوڕی عومەرەوە کە وتویەتی: (الفسوق) سەرپێچی کردن خودای مەزن لە حەرەمدا،[2] هەندێکی تر وتویانە: (الفسوق) لێرەدا جنێو دانە. ئەوانە واز ناهێنن لەوە کە لە فەرموودەی سەحیحدا هاتوە: (جنێودان بە موسوڵمان، دەرچوونە لە هەق‌و ڕاستی‌و شەڕکردنیش لەگەڵی لە دژی کوفرە)[3] عەبدوڕەحمانی کوڕی زەیدی کوڕی ئەسلەم دەڵێت: (الفسوق) لێرەدا سەربڕینی ئاژەڵە بۆ بتەکان. خودای مەزن ئەفەرموێت: ﴿أَوْ فِسْقًا أُهِلَّ لِغَيْرِ اللَّهِ بِهِ﴾[4] یان ئاژەڵێ کە بەناوی غەیرەز خودا سەربڕاوە. زەححاك دەڵێت: (الفسوق) واتە: ناوناتۆرە بە یەکترن وتن. ئەوانەی دەڵێن: (الفسوق) لێرەدا هەموو گوناهێ دەگرێتەوە، وەك خودای مەزن قەدەغەی ناهەقی کردوە لە مانگە حەرامەکاندا، هەرچەندە لە گشت مانگەکانی ساڵدا ستەمکاری قەدەغە کراوە، بەڵام لە مانگە حەرامەکاندا زیاتر جەختی لەسەر کردۆتەوە. هەر بۆیە ئەفەرموێت: ﴿مِنْهَا أَرْبَعَةٌ حُرُمٌ ذَٰلِكَ الدِّينُ الْقَيِّمُ فَلَا تَظْلِمُوا فِيهِنَّ أَنفُسَكُمْ﴾[5] لە چواریاندا شەڕ دەوەستێ، ئەمە ڕەوشتێکی چاکە، لەمانەدا ناهەقی لە خۆتان مەکەن. یان لە بارەی حەرەمەوە فەرموویەتی: ﴿وَمَن يُرِدْ فِيهِ بِإِلْحَادٍ بِظُلْمٍ نُّذِقْهُ مِنْ عَذَابٍ أَلِيمٍ﴾[6] هەر کەسیش لەوێ لە ڕێ لاداو دەس درێژی بکات، ئازارێکی زۆر بە ژانی ئەدەین. لە هەردوو سەحیحەکەشدا هاتوە لە فەرمودەکەی ئەبوحازمەوە لە ئەبوهورەیرەوەکە دەڵێت: پێغەمبەری خودا(ﷺ) فەرموویەتی: (هەرکەسێ حەجی ئەم ماڵە بکات(واتە: کەعبە) کردارو گفتاری نابەجێ نەکات‌و لە گوناهەکانی پاکبۆتەوە،وەك ئەو ڕۆژەی تازە لە دایك بووبێت)[7].

---

[1] . عەتاو موجاهیدو تاوس‌و عیکرمەو سەعیدی کوڕی جوبەیرو موحەممەدی کوڕی کەعب‌و حەسەن‌و قەتادەو ئیبراهیمی نەخەعی‌و زوهری‌و مکحول‌و ئیبنوئەبان‌و ڕەبیعی کوڕی ئەنەس‌و عەتای کوڕی یەسارو عەتای خۆراسانی‌و موقاتیلی کوڕی حەیانیش هەر وایان وتوە.[1]

[2] إبن أبي حاتم غ: (٢/٤٩٧).

[3] فتح الباري(١/١٣٥).

[4] الانعام(١٤٥).

[5] التوبة(٣٦).

[6] الحج(٢٥).

[7] فتح الباري(٤/٢٥)، مسلم(٢/٩٨٣).

## قەدەغە کردنی دەمەقاڵە لە کاتی حەجدا

﴿وَلَا جِدَالَ فِي ٱلْحَجِّ﴾ قسە بەزۆراندان و شەڕو هەرا(بنڕای ببڕ) لە حەجدا نین. مەبەست بە(الجدال) لێرەدا دەمەقاڵێیە. ئیبنوجەریر ڕیوایەتی کردوە لە عەبدوڵلای کوڕی مەسعودەوە لەم دەقەدا ﴿وَلَا جِدَالَ فِي ٱلْحَجِّ﴾ دەڵێت: قرەقرومشت و مڕ لەگەڵ هاوەڵەکەت مەکە هەتا تووڕەی بکەی[1].

## هاندان بۆ چاکە کردن و بەدەستهێنانی توێشوو لە کاتی حەجدا

﴿وَمَا تَفۡعَلُواْ مِنۡ خَيۡرٖ يَعۡلَمۡهُ ٱللَّهُ﴾ هەر کارێکی چاکیش بکەن خودا دەیزانێ. کاتێ کە خودای گەورە قەدەغەی کردارو گفتاری ناشرینی لێ کرد، دوای ئەوە هانیان ئەدات بۆ کاری چاك کردن و خودا خۆشی دەزانێ چی دەکەن، بەو زوانە پاداشتی بە تەواویان ئەداتەوە لە ڕۆژی قیامەتا. پاشان ئەفەرموێت: ﴿وَتَزَوَّدُواْ فَإِنَّ خَيۡرَ ٱلزَّادِ ٱلتَّقۡوَىٰ﴾ توێشووی ڕێگە هەڵگرن، چاکترین توێشووش بۆ ئێوە خۆ لە گوناه پارازتنە. بوخاری و ئەبوداود ڕیوایەتیان کردوە لە ئیبنوعەبباسەوە دەڵێت: ئەوسا خەڵکی یەمەن حەجیان دەکرد توێشویان لەگەڵ خۆیان نەدەبردو دەیان وت: ئێمە پشتمان بە خوا بەستوە. خودای مەزن ئەم ئایەتەی ناردە خوارەوە: ﴿وَتَزَوَّدُواْ فَإِنَّ خَيۡرَ ٱلزَّادِ ٱلتَّقۡوَىٰ﴾ توێشوی ڕێگەتان هەڵگرن، چاکترین توێشووش بۆ ئێوە، خۆ لە گوناه پارازتنە[2]. ئیبنوجەریرو ئیبنومەردەوەیهی ڕیوایەتیان کردوە لە ئیبنوعومەرەوە، دەڵێت: کاتێ کە ئیحرامیان بەست ئەو توێشوەی کە پێیان بوو فڕێیان ئەداو توێشووی تریان هەڵدەگرت. خودای مەزن ئەم ئایەتەی ناردە خوارەوە: ﴿وَتَزَوَّدُواْ فَإِنَّ خَيۡرَ ٱلزَّادِ ٱلتَّقۡوَىٰ﴾ توێشوی ڕێگە هەڵگرن. چاکترین توێشوو بۆ ئێوە خۆ لە گوناه پارازتنە. ئەوەی لێ قەدەغە کردوون، فەرمانی پێدان کە ئاردو سوەیق و چۆرەك(الكعك) لەگەڵ خۆیان هەڵگرن[3].

## توێشوی سەفەری ڕۆژی دوایی

﴿فَإِنَّ خَيۡرَ ٱلزَّادِ ٱلتَّقۡوَىٰ﴾ چاکترین توێشو بۆ ئێوە، خۆپارازتنە لە گوناه. کاتێ کە خودا فەرمانی پێدان کە توێشوی ڕێگە هەڵگرن بۆ دنیا، ڕێنماییشیان دەکات بۆ توێشوو هەڵگرتنی ڕۆژی قیامەت، کە بریتیە لە خۆ پارازتن لە گوناهو خۆ ئامادەکردن بۆ ئەو ڕۆژە. وەك لە ئایەتێکی ترا ئەفەرموێت:

---

[1] الطبري(٤/١٤١).

[2] فتح الباري(٣/٤٤٩)، أبوداود(٢/٣٤٩).

[3] الطبري(٤/١٥٦).

﴿وَرِيشًا وَلِبَاسُ التَّقْوَىٰ ذَٰلِكَ خَيْرٌ﴾[1] پۆشاكی جوانیشمان بۆ ناردوون، چاكتر لەویش پۆشاكی خۆ پارازتنە. كاتێ كە باسی پۆشاك لەبەر كردنی كردوە، ڕێنمایشی كردوە بۆ پۆشاكی خۆپارێزی كە بریتیە لە گەردن كەچیو گوێڕایەڵیو لە خوا ترسی، كە ئەمە زۆر چاكترەو پڕ سوود ترە. پاشان خودای گەورە ئەفەرموێت: ﴿وَاتَّقُونِ يَا أُولِي الْأَلْبَابِ﴾ دەبێ لە من بترسن ئەی كۆمەڵی خاوەن ئاوەزان. واتە: لە تۆڵەو سزام من بترسێ، كەسێ سەرپێچی فەرمانی من بكاتو لێی دەرچێت، ئەی خاوەن ئاوەزو هۆشمەندەكان.

﴿ لَيْسَ عَلَيْكُمْ جُنَاحٌ أَن تَبْتَغُوا فَضْلًا مِّن رَّبِّكُمْ ۚ فَإِذَا أَفَضْتُم مِّنْ عَرَفَاتٍ فَاذْكُرُوا اللَّهَ عِندَ الْمَشْعَرِ الْحَرَامِ ۖ وَاذْكُرُوهُ كَمَا هَدَاكُمْ وَإِن كُنتُم مِّن قَبْلِهِ لَمِنَ الضَّالِّينَ ﴿١٩٨﴾ ﴾

## بازرگانی لە كاتی حەجدا

بوخاری لە ئیبنوعەبباسەوە، ڕیوایەتی كردوە(عەكازو مەجەننەوزولمەجاز) چەند بازاڕێكی سەردەمی نەفامی بوون. كاتێ كە ئیسلام هات بە تاوانیان دەزانی لە كاتی حەجدا بازرگانی بكەن، خودای مەزن ئەم ئایەتەی ناردە خوارەوە: ﴿ لَيْسَ عَلَيْكُمْ جُنَاحٌ أَن تَبْتَغُوا فَضْلًا مِّن رَّبِّكُمْ ﴾ ئەگەر لە كاتی حەجیشدا ڕۆزی لە خوا داوا بكەن، هیچ گوناهێكتان لەسەر نیە. واتە: لەكاتی دروشمەكانی حەجدا[2]. ئەبوداودو كەسانی تریش ڕیوایەتیان كردوە لە ئیبنوعەبباسەوە، دەڵێت: خۆیان دەپارازت لە كڕینو فرۆشیو بازرگانی لە كاتی دروشمەكانی حەجداو دەیان وت: ڕۆژنی یادكردنی خودایە،خودا ئەم ئایەتەی ناردە خوارەوە: ﴿ لَيْسَ عَلَيْكُمْ جُنَاحٌ أَن تَبْتَغُوا فَضْلًا مِّن رَّبِّكُمْ ﴾ ئەگەر لە ماوەی حەجیشدا ڕۆزی لە خودا داوا بكەن،هیچ گوناهتان لەسەر نیە[3]. (هەروا موجاهیدو سەعیدی كوڕی جوبەیرو عیكرمەو ڕەبیعی كوڕی ئەنەسو مەنسوری كوڕی معتمرو قەتادەو ئیبراهیمی نەخەعیو كەسانی تریش تەفسیریان كردوە). ئیبنوجەریر ڕیوایەتی كردوە لە ئەبوئومەیمەوە، دەڵێت: بیستم لە عەبدوڵلای كوڕی عومەر كە پرسیاری لێكرا دەربارەی پیاوێ حەجی دەكردو بازرگانیشی لەگەڵا بوو، ئیبنوعومەر ئەم ئایەتەی خوێندەوە: ﴿ لَيْسَ عَلَيْكُمْ جُنَاحٌ أَن

---

[1] الاعراف(٢٦).

[2] فتح الباري(٨/٣٤).

[3] أبوداود(٢/٣٥٠).

تَبْتَغُواْ فَضْلًا مِّن رَّبِّكُمْ ﴾ ئەگەر لە کاتی حەجدا ڕۆزی لە خوا داوا بکەن هیچ گوناهتان لەسەر نیە[1]. (ئەم فەرموودەیە مەوقوفە، بەڵام بەهێزو چاکە، بە مەرفوعیش ڕیوایەت کراوە). ئیمامی ئەحمەد ڕیوایەتی کردوە لە ئەبوئومامەی تەمیمیەوە، وتم بە ئیبنوعومەر، ئێمە لە کاتی حەجدا کرێمان دەکرد، ئایا حەجمان بۆ هەیە؟ دەڵێت: ئایا ئێوە تەواف بە دەوری بەیتا ناکەن و ناچنە عەرەفەو بەردەکانی فڕێ نادەن و سەرتان ناتاشن؟ دەڵێت وتمان: بەڵێ، ئیبنوعومەر دەڵێت: پیاوێك هاتە خزمەتی پێغەمبەر(ﷺ) هەمان پرسیاری لێ کرد کە تۆ لە منت کرد، ئەویش وەڵامی نەدایەوە هەتا جوبرەئیل(سەلامی خوای لێ بێ)بەم ئایەتەوە هاتە خوارەوە: ﴿ لَيْسَ عَلَيْكُمْ جُنَاحٌ أَن تَبْتَغُواْ فَضْلًا مِّن رَّبِّكُمْ ﴾ ئەگەر لە حەجدا ڕۆزی لە خودا داوا بکەن، هیچ گوناهێکتان لەسەر نیە. پێغەمبەری خودا(ﷺ) بانگی کردو فەرمووی: (ئێوە حاجین)[2] ئیبنوجەریر ڕیوایەتی کردوە لە ئەبوسالمەوە مەولای عومەر دەڵێت: وتم: ئەی گەورەی موسوڵمانان ئایا ئێوە لە حەجدا بازرگانی دەکەن؟ دەڵێت: ئایا بژێویان جگە لە کاتی حەج هەیە[3]؟

**وەستان لە عەرەفە**

﴿فَإِذَآ أَفَضْتُم مِّنْ عَرَفَٰتٍ فَٱذْكُرُواْ ٱللَّهَ عِندَ ٱلْمَشْعَرِ ٱلْحَرَامِ﴾ ئەگەر لە عەرەفات گەڕانەوە لە پەنای(مشعر الحرام) یادی ناوی خودا بکەن. ﴿عَرَفَٰتٍ﴾ (ممنوع من الصرف) نیە، هەرچەندە(عەلەم ێکی موئەنسە،) چونکە لە بنەڕەتدا کۆیە، وەك(مسلماتٍ و مؤمناتٍ) بە شوێنێکی دیاری کراو ناوی براوەو سەیری بنەڕەتەکەی نەکراوە بە(ممنوع من الصرف)، ئەمە ڕاوبۆچوونی ئیبنوجەریرە[4] عەرەفە: شوێنی وەستانە لە کاتی حەجدا،لە گرینگترین پایەکان حەجە. هەر بۆیە ئیمامی ئەحمەدو ئەهلی سونەنەکان بە سەنەدی سەحیح ڕیوایەتیان کردوە لە عەبدوڕەحمانی کوڕی یەعموری دیلیەوە دەڵێت: بیستم لە پێغەمبەری خودا(ﷺ) ئەیفەرموو: (حەج عەرەفاتە(سێ جار فەرمووی) هەر کەسێ گەیشتە عەرەفە بەرلەوەی خۆر دەرکەوێ،فریا کەوتوە، ڕۆژەکانی مینا سێ ڕۆژە هەر کەسێ دوو ڕۆژی پێش بخات(شەیتان ڕەجم بکات) گوناهی ناگات. هەرکەسیش دوا بکەوێ(سێ

---

[1] الطبري(٤/١٦٥).

[2] أحمد(١/١٥٥)، حاکمو زەهەبی بە سەحیحیان داناوە.

[3] الطبري(٤/١٦٨).

[4] الطبري(٤/١٧١).

ڕۆژ ڕەجم بكات) گوناهی لەسەرنییە)[1]. كاتی وەستانی عەرەفە لە لادانی خۆر لە ناوەندی ئاسمان دەست پێدەكا هەتا بەرەبەیانی ڕۆژی جەژنی قوربان كە ڕۆژی قوربانیە،چونكە پێغەمبەری خودا(ﷺ) لە حەجی ماڵئاوایدا وەستا،دوای ئەوە نوێژی نیوەڕۆی كرد،خۆر ئاوا بوو. پاشان فەرمووی: (دروشمەكانتان لە منەوە وەرگرن)[2]، لەم فەرموودەشدا هاتووە: (هەركەسێ پێشی ئەوەی خۆر هەڵبێت گەیشتە عەرەفە، ئەوە فریا كەوتوە)، واتە: حەجەكەی دروستە، لە عوروەی كوڕی موزەریسی(مُضَرّ) كوڕی حارسەی كوڕی لامی تائیەوە(لام الطائي) دەڵێت: هاتمە خزمەت پێغەمبەری خودا(ﷺ) لە موزدەلیفە كاتێ كە چوو بۆ نوێژ، وتم: ئەی پێغەمبەری خودا(ﷺ) من لە كێوی تەییئەوە هاتووم وڵاغەكەم شەكەت كردوەو خۆشم ماندوو كردوە. سوێند بە خوا هیچ كێوێكم بەجێنەهێشتوە لەسەری ڕانەوەستایم، ئایا من حەجم بۆ هەیە؟ پێغەمبەری خودا(ﷺ) فەرمووی: (هەركەسێ ئامادەی ئەم نوێژەمان بووبێ‌و لەگەڵمان وەستابێ هەتا دەردەچین، پێش ئەوە لە عەرەفە وەستا بێ بە شەو یان بە ڕۆژ، حەجەكەی تەواو كردوەو چڵكی گوناهی لە خۆی لابردوە). ئیمامی ئەحمەدو خاوەن سونەنەكانیش ڕیوایەتیان كردوەو تیرمیزی بە سەحیحی داناوە[3]) وتراوە: بۆیە بە عەرەفە ناونراوە، عەبدوڕەزاق ڕیوایەتی كردوە دەڵێت: ئیبنوجورەیج هەواڵی پێداوم ئیبنولموسەیب دەڵێت: عەلی كوڕی ئەبوتالیب دەڵێت: خودای مەزن جوبرەئیلی نارد بۆ لای ئیبراهیم(سەلامی خوای لێ بێ) حەجی پێكرد هەتا كاتێ گەیشتە عەرەفە، دەڵێت: (عرفتُ) زانیومە. جارێك پێش ئەوە هاتبوە ئەو شوێنە. لەبەر ئەوە ناونرا بە عەرەفە،[4] ئیبنوموبارەك دەڵێت: لە عەبدولمەلیكی كوڕی ئەبوسولەیمانەوە لە عەتاوە، دەڵێت: بۆیە ناونرا بە عەرەفە، چونكە جوبرەئیل دروشمەكانی حەجی پیشانی ئیبراهیم ئەداو ئەویش دەیوت: زانیومە، زانیومە(عرفتُ، عرفتُ)، ئیتر ناونرا بە عەرەفات[5] هەر بەو جۆرە ڕیوایەت كراوە لە ئیبنوعەبباسەوە[6]. لە ئیبنوعومەرو ئەبومیجلزیشەوە ڕیوایەت كراوە.([7]

---

[1] أحمد(٤/٣١٠)، أبوداود(٢/٤٨٥)، تحفة الاحوذي(٣/٦٣٣)، النسائي(٥/٢٥٦)، ابن ماجة(٢/١٠٠٣)، فەرموودەیەكی باشە(جید).

[2] مسلم(٢/٩٤٣).

[3] أحمد(٤/٢٦١)، أبوداود(٢/٤٨٦)، تحفة الاحوذي(٣/٦٣٥)، النسائي(٥/٢٦٤)، ابن ماجة(٢/١٠٠٤)، فەرموودەیەكی سەحیحە.

[4] عبدالرزاق(٥/٩٦).

[5] الطبري(٤/١٧٤).

[6] الطبري(٤/١٧٣).

[7] إبن أبي حاتم غ: (٢/٥١٩).

والله أعلم). عەرەفان بە(المشعر الحرام و المشعر الاقضی) و إلال(لەسەر وەزنی هیلال) بەو کێوە وتراوەکە لە ناوەڕاستیدا بووە: (کێوی ڕەحمەت).

## کاتی گەڕانەوە لە عەرەفاتو موزدەلیفە

ئیبنوئەبی حاتەم ڕیوایەتی کردوە لە ئیبنوعەبباسەوە، دەڵێت: خەڵکی لە کاتی نەفامیدا لە عەرەفە دەوەستان هەتا ئەو کاتەی خۆر دەکەوتە سەر کێوەکان وەك مێزەرە(العمائم) لەسەر سەری پیاوان. ئینجا دەستیان بە ڕۆشتن دەکرد، پێغەمبەری خودا(ﷺ) ئەو ڕۆشتنەی دوا خست لە عەرەفەوە هەتا خۆر ئاوا بوون[1] ئیبنومەردەوەیهی ئەمەی بۆ زیاد کردوە: پاشان لە موزدەلیفە وەستاو لە بەرەبەیاندا نوێژی بەیانی کرد، هەتا کاتێ هەموو شتێ ڕوناکی تێکەوتو لە کاتی دوایدا کەوتە ڕێ،(ئەم فەرموودە سەنەدەکەی حەسەنە). وە لە فەرموودە درێژەکەی جابیری کوڕی عەبدوڵلاوە کە لە سەحیحی موسلیما هاتوە کە تێیدا وتویەتی: هەر لە عەرەفە ڕاوەستا بوو هەتا خۆر ئاوا بوو زەردەی نەما ڕۆشت. ئوسامەی خستە پاشکۆی خۆی. پێغەمبەر(ﷺ) جڵەوی قەسوای توند کردبوو هەتا سەری ئەیدا لەبەردەمی کۆپانەکەی، بەردەوام بە دەستی ڕاستی ئاماژەی دەکردو ئەیفەرموو: (خەڵکینە لەسەرخۆیی لەسەرخۆیی) هەر کە دەگەیشتە تەپۆلکەیەکی لم،جڵەوی بۆ شل دەکرد[2]، تا بە ئاسانی سەر بکەوێت، هەتا گەیشتە(موزدەلیفە) ئەوسا نوێژی شێوانو خەوتنانی بە بانگێكو دوو قامەت،کرد ویردی تەسبیحاتی لە نێواندا نەخوێند، پاشان پێغەمبەر(ﷺ) ڕاکشا هەتا بەرەبەیان، ئینجا کە زانی بەیانییە، بە بانگو قامەتێك نوێژی بەیانی کرد، دیسانەوە سواری قەسواو بۆوە، هەتا گەیشتە(المشعر الحرام)، لەوێ ڕووی کردە قیبلەو لە خودا پاڕایەوە(الله أكبر، لا إله إلا الله وحده)ی فەرموو، هەر وەستا، هەتا بە تەواوی دنیا ڕووناك بۆوە. پێش ئەوەی خۆر هەڵبێ‌و وشترەکەی لێخوڕی[3] لە هەردوو سەحیحەکەدا هاتوە،لە ئوسامەی کوڕی زەیدەوە کە پرسیاری لێکرا پێغەمبەری خودا(ﷺ)چۆن دەڕۆیی کاتێ عەرەفەی بەجێهێشت؟ دەڵێت: مام ناوەندی دەڕۆیشت، ئەگەر بوارێکی بەدی بکردایە خێراتر دەبوو[4].

---

[1] إبن أبي حاتم غ: (٢/٥١٧).

[2] الكلمات بالحاء المهملة و هو التل اللطيف من الرمل الضخم، و في النهاية/ قيل: الحبال في الرمل كالجبال في غير الرمل.

[3] مسلم(٢/٨٨٦).

[4] (العنق) بە مام ناوەندی ڕۆشتن(النعی) خێراتر لەوە. فتح الباري(٣/٦٠٥)، مسلم(٢/٩٣٦).

**مەشعەری حەرام**

عەبدورەزاق ڕیوایەتی کردوە لە سالمەوە کە: ئیبنوعومەر دەڵێت: موزدەلیفە هەمووی مەشعەری حەرامە[1] هەشیم لە حەجاجەوە دەڵێت، لە نافیعەوە لە ئیبنوعومەرەوە کە پرسیاری لێکرالەبارەی ئەم دەقەوەدا ﴿فَٱذۡكُرُواْ ٱللَّهَ عِندَ ٱلۡمَشۡعَرِ ٱلۡحَرَامِ﴾ لە پەنای(مشعر الحرام) یادی ناوی خودا بکەن. دەڵێت: وتویەتی: ئەو کێوەو ئەوەی بە دەوریایەتی.[2] ڕیوایەت کراوە لە ئیبنوعەبباس‌و سەعیدی کوڕی جوبەیرو عیکرمەو موجاهیدو سوودی‌و ڕەبیعی کوڕی ئەنەس‌و حەسەن‌و قەتادەوە کە وتویانە ئەوەیە کە لە نێوان دوو کێوەکەدایە[3]، ئیمامی ئەحمەد ڕیوایەتی کردوە لە جوبەیری کوڕی موتعیمەوە لە پێغەمبەرەوە(ﷺ) فەرموویەتی: (هەموو عەرەفات شوێنی وەستانە جگە لە عورونە وە هەموو موزدەلیفە شوێنی وەستانە جگە لە( موحەسیر)، هەموو ڕێگاکانی مەککە شوێنی قوربانیە، هەموو ڕۆژەکانی تەشریق ئاژەڵ سەربڕینە)[4]. پاشان خودای مەزن ئەفەرموێت: ﴿وَٱذۡكُرُوهُ كَمَا هَدَىٰكُمۡ﴾ یادی خوداش بکەن کە ڕێنمونی کردن. ئاگادار کردنەوەیە لەسەر ئەو بەهرانەی کە پێی داون لە ڕێینیشاندان‌و بۆ دروشمەکانی حەج‌و ئەوەی ئیبراهیمی خەلیلی لەسەر بووە(سەلامی خوای لێ بێ)، هەر بۆیە خودای گەورە ئەفەرموێت: ﴿وَإِن كُنتُم مِّن قَبۡلِهِۦ لَمِنَ ٱلضَّآلِّينَ﴾ ئێوە لە پێش ئەوەدا لە گومڕایان بوون. واتە: پێش هاتنی قورئان‌و پێش هاتنی پێغەمبەر،( هەموو لەیەکەوە نزیکن‌و بەستراون بە یەکەوەو ڕاستن).

﴿ ثُمَّ أَفِيضُواْ مِنۡ حَيۡثُ أَفَاضَ ٱلنَّاسُ وَٱسۡتَغۡفِرُواْ ٱللَّهَۚ إِنَّ ٱللَّهَ غَفُورٞ رَّحِيمٞ ﴿١٩٩﴾ ﴾

**فەرماندان بە پابەند بوون بە وەستان لە عەرەفەداو گەڕانەوە لێیەوە (بۆ ئەو کەسانەی لە کاتی نەفامیدا تێیدا نەوەستا بوون)**

پاشان لێرەدا چوونی هەواڵ ئەسەر هەواڵە بە دوای یەکدا، وەك ئەوەی خودای مەزن فەرمانی داوە بەو کەسانەی لە عەرەفات وەستان بەرەو موزدەلیفەبە ڕێکەون بۆ یادی خودا کردن لە مەشعەری حەرامدا ئەفەرموێت: ﴿ ثُمَّ أَفِيضُواْ مِنۡ حَيۡثُ أَفَاضَ ٱلنَّاسُ﴾ پاشان بگەڕێنەوە لەو شوێنەی خەڵکی لێی دەگەڕێنەوە.هەر وەها فەرمان دەکات لە وەستانی لەگەڵ ئەو خەڵکەدا بێ لە عەرەفاتدا،

---

[1] إبن أبي حاتم غ: (٢/٥٣١).

[2] الطبري(٤/١٧٦).

[3] إبن أبي حاتم غ: (٢/٥٢١).

[4] أحمد(٤/٨٢)،سەنەدەکانی مونقەتیعە.

وەك چۆن ئەو خەڵكە وەستاون، کە هەر قورەیشیەکانی تێدا نیە. چونکە ئەوان بۆ ئەوە دەرنەچوون لە حەرەمەوە لە لایەکی حەرەمدا بوستن لە کەمترین شوێنا. بەڵکو دەڵێن: ئێمە خەڵکی خوداین لە شارەکەیداو دانیشتوی ماڵەکەی ئەوین. بوخاری لە عائیشەوە ڕیوایەتی کردوە قورەیشیەکانو ئەوانەی هاوڕای ئەوان بوون لە موزدەلیفە ڕادەوەستان، پێیان دەوترا(الحمس)،لە هەمان کاتدا عەرەبەکانی تر لە عەرەفاتدا دەوەستان، کاتێ کە ئیسلام هات خودا فەرمانی دا بە پێغەمبەرەکەی(ﷺ) کە بچێتە عەرەفاتو لەوێ ڕاوەستێو ئینجا لەوێوە بگەڕێتەوە، بۆیە خودای مەزن ئەفەرموێت: ﴿مِنۡ حَيۡثُ أَفَاضَ ٱلنَّاسُ﴾ لەو شوێنەی خەڵکی لێی دەگەڕێنەوە.[1] ئیبنوعەبباسو موجاهیدو عەتایش هەر وایان وتوە،[2] ئیبنوجەریریش ئەو ڕایەی هەڵبژاردوەو دەڵێ کۆڕای زانایانی لەسەرە. قەتادەو سوودیو کەسانی تریش هەر وا دەڵێن،[3] ئیمامی ئەحمەد ڕیوایەتی کردوە لە جوبەیری کوڕی موتعیمەوە وشترێکم لێ ون بوو لە عەرەفەدا، ڕۆشتم دەگەڕام بە دوایدا، لەو کاتەدا پێغەمبەر(ﷺ) وەستا بوو. وتم: ئەمە لە(حمس)ە چی دەکات لێرە.[4] لە هەردوو سەحیحەکەدا هاتوە،[5] پاشان بوخاری ڕیوایەتی کردوە لە ئیبنوعەبباسەوە، هەڵدەگرێ مەبەست لە گەڕانەوە لێرەدا گەڕانەوە بێ لە موزدەلیفەوە بۆ مینا بۆ فڕێدانی بەردەکان والله أعلم[6].

## فەرماندان بە پاڕانەوەو هەندێ لە دوعای پاڕانەوە

﴿وَٱسۡتَغۡفِرُواْ ٱللَّهَۚ إِنَّ ٱللَّهَ غَفُورٞ رَّحِيمٞ﴾ لە خودا بپاڕێنەوە بتانبەخشێ، خودا لە تاوان دەبورێو دلۆڤانە. زۆر جار خودای مەزن فەرمان دەکات بە یاد کردنی، دوای تەواو بوونی عیبادەتەکان، وەك لە سەحیحی موسلیما هاتووە کە پێغەمبەری خودا(ﷺ) کاتێ لە نوێژ دەبوەوە سێ جار داوای لێ بووردنی لە خودا دەکرد[7]، لە هەردوو سەحیحەکەدا هاتووە(کە پێغەمبەری خودا) سیوسێ جار(سبحان الله والحمدلله والله أكبر)ی دەکرد[8]، لە ڕێزی ڕۆژی عەرەفەدا لە بەشێکا هێناومانەو کۆمان کردۆتەوە. ئیبنومەردەوەیهی ئەو فەرموودەیەی هێناوە کە بوخاری ڕیوایەتی کردوە

---

[1] فتح الباري(٨/٣٥).

[2] الطبري(٤/١٨٦).

[3] الطبري(٤/١٨٧).

[4] أحمد(٤/٨٠)، سەحیحە.

[5] فتح الباري(٣/٦٠٢)، مسلم(٢/٨٩٤).

[6] فتح الباري(٨/٣٥).

[7] مسلم(١/٤١٤).

[8] فتح الباري(٢/٣٨٧)، مسلم(١/٤١٧).

لە شەدادی کوڕی ئەوسەوە، دەڵێت: پێغەمبەری خودا(ﷺ) فەرموویەتی: (مەزنترین داوای لێخۆشبوون ئەوەیە کە بەندەی(موسوڵمان) بڵێ( ئەی خودایە تۆ پەروەردگاری منی، هیچ پەرستراوێك نیە جگە لە تۆ، منت دروست کردوە، من بەندەی تۆم‌و لەسەر پەیمان‌و بەڵێنی تۆم تا بتوانم، پەنا بە تۆ دەگرم لەو خراپانەی کردومە، داندەنێم بە بەهرەو چاکەکانتدابەسەرمەوە، دانیش دەنێم بە تاوانمدا، دەسا لێم ببورە، چونکە بێگومان هیچ کەس لە تاوان نابورێ جگە لەخۆت، هەر کەسێ ئەم دوعایە لە شەودابڵێ، بڕوای بتەوی پێی بێ‌و لە شەودا بمرێ ئەو کەسە چووەتە بەهەشت، هەرکەسێ لە ڕۆژەکەیدا بیڵێ‌و بمرێ چووەتە بەهەشت)[1] لە هەردوو سەحیحەکەدا هاتوە لە عەبدوڵلای کوڕی عەمرەوە کە ئەبوبەکر دەڵێت: ئەی پێغەمبەری خودا(ﷺ) فێری دوعایەکم بکە لە نوێژەکەمدا بیکەم، فەرمووی: (بڵێ ئەی خودایە ناهەقیم لە خۆم کردوە، ناهەقیەکی زۆر، هیچ کەس لە گوناه نابورێ جگە لە تۆ، لێم خۆشبە، بە لێخۆش بوونێك لەلایەن خۆتەوە، بەزەیت پێمدا بێتەوە، بێگومان هەر تۆ لێبوردەو دلۆڤانی)[2] فەرموودە دەربارەی لێبوردن زۆرە.

﴿فَإِذَا قَضَيْتُم مَّنَاسِكَكُمْ فَاذْكُرُوا اللَّهَ كَذِكْرِكُمْ آبَاءَكُمْ أَوْ أَشَدَّ ذِكْرًا ۗ فَمِنَ النَّاسِ مَن يَقُولُ رَبَّنَا آتِنَا فِي الدُّنْيَا وَمَا لَهُ فِي الْآخِرَةِ مِنْ خَلَاقٍ ﴿٢٠٠﴾ وَمِنْهُم مَّن يَقُولُ رَبَّنَا آتِنَا فِي الدُّنْيَا حَسَنَةً وَفِي الْآخِرَةِ حَسَنَةً وَقِنَا عَذَابَ النَّارِ ﴿٢٠١﴾ أُولَٰئِكَ لَهُمْ نَصِيبٌ مِّمَّا كَسَبُوا ۚ وَاللَّهُ سَرِيعُ الْحِسَابِ ﴿٢٠٢﴾﴾

**فەرماندان بەزۆر زیکرو یادی خودا کردن‌و داوای چاکەی دنیاو ڕۆژی دوایی دوای تەواو کردنی دروشمەکان**

﴿فَإِذَا قَضَيْتُم مَّنَاسِكَكُمْ فَاذْكُرُوا اللَّهَ كَذِكْرِكُمْ آبَاءَكُمْ﴾ هەر کاتێ ئێوە ڕێوشوێنی پێداویستیتان بەجێ هێنا، وەك یادی باب‌و باپیری خۆتان دەکەن(هەر ئاواو لەوە زیاتریش) یادی خودا بکەن. خودای گەورە فەرمان دەکات بە زۆر یاد کردنی دوای تەواو کردنی دروشمەکانی حەج‌و لێبونەوە لێی. سەعیدی کوڕی جوبەیر لە ئیبنوعەبباسەوەدەڵێت: خەڵکی لە کاتی نەفامیدا ڕادەوەستان لە دروشمەکاندا، پیاوی وایان هەبوو دەیوت: ئەوسا باوکم میران پەروەر بوو، ئامادەی شەڕەکان دەبوو، خوێندانی دەگرتە ئەستۆی خۆی، هیچ شتێکیان لە دوا بەجێ نەدەما جگە لە یادی باب‌و باپیرانیان (واتە: ناوبانگی هەمووان ناوبانگی باپیرانە)، خودای مەزن ئەم ئایەتەی ناردە خوارەوە بۆ

[1] فتح الباري(١١/١٠٠).

[2] فتح الباري(١٣/٤٨٤)، مسلم(٤/٢٠٧٨).

موحەممەد(ﷺ): ﴿فَإِذَا قَضَيْتُم مَّنَاسِكَكُمْ فَاذْكُرُوا اللَّهَ كَذِكْرِكُمْ آبَاءَكُمْ أَوْ أَشَدَّ ذِكْرًا﴾[1] وەك یادی باب‌و باپیری خۆتان دەكەن(هەر ئاواو لەوە زیاتریش) یادی خودا بكەن. مەبەست پێی هەڵنانە بۆ زیاتر یادی خودا كردن، هەر بۆیە ﴿أَوْ أَشَدَّ ذِكْرًا﴾ مەنسوب كراوە لەسەر تەمیز ﴿أَوْ﴾ لێرەدا بۆ بەجێ هێنانی هاوشێوەییە لە چاكەكردنداو بە زیادیشەوە، وەك خودای مەزن ئەفەرموێت: ﴿فَهِيَ كَالْحِجَارَةِ أَوْ أَشَدُّ قَسْوَةً﴾[2] لە چەشنی بەرد بگرە ڕەقتریش بوو لە بەرد. ئەفەرموێت: ﴿يَخْشَوْنَ النَّاسَ كَخَشْيَةِ اللَّهِ أَوْ أَشَدَّ خَشْيَةً﴾[3] لە خەڵكی دەترسان وەك ترسان لە خودا بگرە زیاتریش دەترسان. وە ئەفەرموێت: ﴿وَأَرْسَلْنَاهُ إِلَىٰ مِائَةِ أَلْفٍ أَوْ يَزِيدُونَ﴾[4] ناردمانە ناو سەد هەزار یان زیاتر. وە ئەفەرموێت: ﴿فَكَانَ قَابَ قَوْسَيْنِ أَوْ أَدْنَىٰ﴾[5] بە ئەندازەی ماڵی دوو كەوان یان نزیكتر. لێرەدا هیچ گومانێك نیە بەڵكو ڕاستی هاتنە جێی ئەو شتە دەگەیەنێت‌و زیاتریش لەوە. پاشان خودای مەزن ڕێنمایی عەبدەكانی دەكات بۆ لێپاڕانەوەی دوای زۆر یاد كردنی بۆ ئەوەی داواكانیان لێ قبووڵ بكا، زەمی ئەو كەسانەش دەكات كە هەر داوای شتی دنیایی دەكەن‌و دوا ڕۆژی خۆیان لەبیر كردوەو پشتگوێیان خستوە. ئەفەرموێت: ﴿فَمِنَ النَّاسِ مَن يَقُولُ رَبَّنَا آتِنَا فِي الدُّنْيَا وَمَا لَهُ فِي الْآخِرَةِ مِنْ خَلَاقٍ﴾ هی وا هەیە دەڵێ پەروەردگارمان، لە دنیادا بماندەرێ، ئەوانە لە ڕۆژی قیامەتدا بەشیان نیە. ئەم زەم كردنە ئەو كەسانەش دەگرێتەوە كە چاو لەوانە دەكەن، خاوەن باوەڕان دەبێ لەوانە دوور كەونەوەو وەك ئەوانە نەبن. سەعیدی كوڕی جوبەیر لە ئیبنوعەبباسەوە دەڵێت: كۆمەڵێ لە عەرەبەكان دەهاتن بۆ وەستان لە دروشمەكانداو دەیانوت: ئەی خودایە ئەم ساڵە ساڵی باران بارین‌و داهات‌و لە دایك بوونی چاك بێ، باسی هیچ شتێكی ڕۆژی قیامەتیان نەدەكرد، خودای گەورە دەربارەی ئەوانە ئەمەی ناردە خوارەوە: ﴿فَمِنَ النَّاسِ مَن يَقُولُ رَبَّنَا آتِنَا فِي الدُّنْيَا وَمَا لَهُ فِي الْآخِرَةِ مِنْ خَلَاقٍ﴾ هی وا هەیە لە خەڵكی دەڵێ ئەی پەروەردگارمان لە دنیادا چاكەمان لەگەڵا بكە، ئەوانە لە ڕۆژی دواییدا بەشیان نیە. بەڵام دوای ئەوان خەڵكی تر دێن لە خاوەن باوەڕان دەڵێن:

---

[1] إبن أبي حاتم غ: (٢/٥٣٠).

[2] البقرة(٧٤).

[3] النساء(٧٧).

[4] الصافات(١٤٧).

[5] النجم(٩).

﴿رَبَّنَآ ءَاتِنَا فِي ٱلدُّنۡيَا حَسَنَةً وَفِي ٱلۡأٓخِرَةِ حَسَنَةً وَقِنَا عَذَابَ ٱلنَّارِ﴾ هی وایش هەیە دەڵێ: ئەی پەروەردگارمان هەم لەم دنیاو هەم لەو دنیاش تووشی خێرو خۆشیمان کەو لە ئازاری ئاگریش بمانپارێزە، خودای مەزن ئەمەیشی ناردە خوارەوە کە ئەفەرموێت: ﴿أُوْلَٰٓئِكَ لَهُمۡ نَصِيبٞ مِّمَّا كَسَبُواْۚ وَٱللَّهُ سَرِيعُ ٱلۡحِسَابِ﴾ جا ئەوان بەپێی کردەوەیان پاداشتیان دەبێ، خودا بەپەلە بە کاروباریان ڕادەگا. هەر بۆیە خودا ستایشی ئەو کەسانە دەکات کە داوای خێرو خۆشی دنیاو قیامەت دەکەن و ئەفەرموێت: ﴿ وَمِنۡهُم مَّن يَقُولُ رَبَّنَآ ءَاتِنَا فِي ٱلدُّنۡيَا حَسَنَةً وَفِي ٱلۡأٓخِرَةِ حَسَنَةً وَقِنَا عَذَابَ ٱلنَّارِ﴾ هی وا هەیە لە خەڵکی دەڵێ: ئەی پەروەردگارمان هەم لە مدنیاو هەم لەو دنیاش تووشی خێرو خۆشیمان بکەو لە ئازاری ئاگریش بمانپارێزە. ئەو لاڵەیە گشت خێری دنیای تیا کۆبوەتەوە، هەموو خراپەکانی دورخستۆتەوە، چونکە چاکەی دنیا هەموو شتێ دەگرێتەوە لە تەندروستیو خانوی باشو ژنی چاکو ڕۆزی فراوانو زانستی بەسوودو ئاکاری چاکو پێویستی سواریو ستایشی جوانو گەلێ شتی تریش کە زانایانی تەفسیر باسیان لێکردوە، هەموو لە ریزی چاکەی دنیا هەژمار دەکرێت. بەڵام خێرو بێری ڕۆژی دوایی، بەرزترینیان چوونە ناو بەهەشتو ئەوەی پەیوەندی پێوە هەیە وەك دڵنیایی لە کارەساتە گەورەکەی ڕۆژی قیامەت لە گۆڕەپانی مەحشەرداو ئاسان کردنی لێپرسینەوەو گەلێ شتی تر لەو شتانەی بۆ بەندەکان چاکن. لە بارەی ڕزگار بوون لە ئاگریش، بەوە دەبێ کە هۆکارەکانی بۆ ڕێکخرێت لە دنیادا لە دوورکەوتنەوە لە گوناهو قەدەغەکراوەکانو وازهێنان لە شتە گوماناویو حەرامەکان. قاسمی کوڕی عەبدورەحمان دەڵێت: هەرکەسێ دڵێکی ستایشکەرو زمانێکی بە یادی خواو جەستەیەکی خۆڕاگری پێ بەخشرا، ئەوە ئەو کەسە لە دنیاو لە ڕۆژی دوایدا خێرو بێری پێ بەخشراوە ولە ئازاری ئاگریش پارێزراوە.[1] هەر بۆیە لە فەرمودەیشدا موسڵمان هاندراوە بۆ ئەم دوعایە. بوخاری ڕیوایەتی کردوە لە ئەنەسی کوڕی مالیکەوە: پێغەمبەری خودا(ﷺ) ئەیفەرموو: (ئەی خودایە، پەروەردگارمان، هەم لەم دنیاو هەم لەو دنیاش تووشی خێرو خۆشیمان بکەو لە ئازاری ئاگریش بمانپارێزە)[2] ئیمامی ئەحمەد ڕیوایەتی کردوە لە ئەنەسەوە: کە پێغەمبەری خودا(ﷺ) سەردانی پیاوێکی لە موسوڵمانان کرد وەك(زەرنەقوتەی) لێهاتبوو، پێغەمبەری خودا(ﷺ)پێی فەرمووی: (ئایا تۆ پاڕایتەوە بە شتێ،یان داوات لە خودا کردوە؟) دەڵێت: بەڵێ، من وتومە: ئەی خودایە ئەوەی کە تۆڵەم لێ دەسێنی لەسەری، لە ڕۆژی دوایدا،لە دونیا لێم بسێنە. پێغەمبەری

[1] إبن أبي حاتم غ: (٢/٥٤٢).

[2] فتح الباري(٨/٣٥).

خودا(ﷺ) فەرمووی: ((سبحان الله) بەرگەی ناگری،یان لە توانای تۆدا نیە، با بتوتایە: ﴿رَبَّنَآ ءَاتِنَا فِي ٱلدُّنۡيَا حَسَنَةٗ وَفِي ٱلۡأٓخِرَةِ حَسَنَةٗ وَقِنَا عَذَابَ ٱلنَّارِ﴾( ئەی پەروەردگارم هەم لە دنیاو هەم لە ڕۆژی دوایدا تووشی خێرو خۆشیمان بکەو لە ئازاری ئاگریش بمانپارێزە.)پاشان دەڵێت:بەم دوعایە لە خودا پاڕایەوە، خودا شیفایدا[1] (موسلیمش بە تەنیا خۆی هێناویەتی)[2]، حاکیم ڕیوایەتی کردوە لە موستەدرەکەکەیدا لە سەعیدی کوڕی جوبەیرەوە، دەڵێت: پیاوێ هات بۆ لای ئیبنوعەبباسو دەڵێت: من لە کۆمەڵێکا خۆم کردە کرێکار تا بمگرنە خۆیان، هەندێ لە کرێکاریەکەم پێدان هەتا ڕێگریم لێ نەکەن لەگەڵیان بڕۆم بۆ حەج، ئایا ئەوە پاداشتی هەیە؟ ئیبنوعەبباس دەڵێت: تۆ لەو کەسانەی کە خودای مەزن ئەفەرموێت: ﴿أُوْلَٰٓئِكَ لَهُمۡ نَصِيبٞ مِّمَّا كَسَبُواْۚ وَٱللَّهُ سَرِيعُ ٱلۡحِسَابِ﴾[3] ئەوان بەپێی کردەیان بەشیان دەبێ، خودا لێپرسینەوە بەپەلە دەکا[4].

﴿وَٱذۡكُرُواْ ٱللَّهَ فِيٓ أَيَّامٖ مَّعۡدُودَٰتٖۚ فَمَن تَعَجَّلَ فِي يَوۡمَيۡنِ فَلَآ إِثۡمَ عَلَيۡهِ وَمَن تَأَخَّرَ فَلَآ إِثۡمَ عَلَيۡهِۖ لِمَنِ ٱتَّقَىٰۗ وَٱتَّقُواْ ٱللَّهَ وَٱعۡلَمُوٓاْ أَنَّكُمۡ إِلَيۡهِ تُحۡشَرُونَ ٢٠٣﴾

**یادی خودا لە ڕۆژەکانی تەشریقدا کە ڕۆژی خواردنو خواردنەوەن**

﴿وَٱذۡكُرُواْ ٱللَّهَ فِيٓ أَيَّامٖ مَّعۡدُودَٰتٖ﴾ لە ڕۆژانی دیاریکراودا یادی خوداو لەبیر نەچێ. ئیبنوعەبباس دەڵێت: (الایام المعدودات) ڕۆژانی تەشریقە. (أیام المعدودات) دە ڕۆژەکەی (ذو الحەجەیە)[5] عیکرمە دەڵێت: ﴿وَٱذۡكُرُواْ ٱللَّهَ فِيٓ أَيَّامٖ مَّعۡدُودَٰتٖ﴾ لە ڕۆژانی دیاریکراو یادی خودات لەبیر نەچێ. واتە(الله أکبر الله أکبر) بکە لە ڕۆژەکانی تەشریقدا دوای نوێژە فەرزەکان،[6] ئیمامی ئەحمەد ڕیوایەتی کردوە لە عوقبەی کوڕی عامیرەوە دەڵێت: پێغەمبەری خودا(ﷺ) فەرموویەتی: (ڕۆژی عەرەفەو ڕۆژی قوربانیو ڕۆژانی تەشریق جەژنمانە ئەی کۆمەڵی موسوڵمانان، ئەوانە ڕۆژانی خواردنو خواردنەوەن)[7] دیسان ئیمامی ئەحمەد ڕیوایەتی کردوە، لە نوشەیبەی هوزەلیەوە:

---

[1] أحمد(٣/١٠٧)، سەحیحە.

[2] مسلم(٤/٢٠٦٨).

[3] الحاکم(٢/٢٧٧).

[4] پاشان حاکیم دەڵێت: فەرموودەیەکی سەحیحە لەسەر مەرجی بوخاریو موسلیم بەڵام ئەوان نەیانهێناوە.

[5] القرطبي(٣/٣).

[6] إبن أبي حاتم غ: (٢/٥٤٥).

[7] أحمد(٤/١٥٢)، سەحیحە.

پێغەمبەری خودا(ﷺ) فەرموویەتی: (ڕۆژانی تەشریق، ڕۆژانی خواردن‌و خواردنەوەو یادی خودایە) موسلیمش ڕیوایەتی کردوە[1]ن لە پێشەوەش لە فەرموودەکەی جوبەیری کوڕی موتعیمدا باس کرا کە: (عەرەفە هەمووی جێی وەستانە. ڕۆژانی تەشریق هەمووی ئاژەڵ سەربڕینە)[2] دیسان لە پێشدا لە فەرموودەکەی عەبدوڕەحمانی کوڕی یەعموری دەیلدا باس کرا کە: (ڕۆژانی مینا سێ ڕۆژە، هەرکەس دوو ڕۆژی پێش بخا ت گوناهی نایەتە سەر، هەرکەسێکیش دواکەوت گوناهی لەسەر نیە)[3] ئیبنوجەریر ڕیوایەتی کردوە لە ئەبوهورەیرەوە کە پێغەمبەری خودا(ﷺ) فەرموویەتی: (ڕۆژانی تەشریق ڕۆژانی خواردنەوەو یادی خودایە)[4] دیسان ئیبنوجەری ڕیوایەتی کردوە لە ئەبوهورەیرەوە کە پێغەمبەری خودا(ﷺ) عەبدوڵلای کوڕی حوزافەی نارد دەگەڕا بە میناداو دەیوت: (ڕۆژوو مەگرن لەم ڕۆژانەدا، چونکە ئەم ڕۆژانە، ڕۆژانی خواردن‌و خواردنەوەو یادی خودای مەزنە).[5]

## ڕوونکردنەوەی ڕۆژانی دیاریکراو

میقسە لە ئیبنوعەبباسەوەدەڵێت: (الأيام المعدودات) ڕۆژانی دیاریکراو، ڕۆژانی تەشریقە کە چوار ڕۆژە: ڕۆژی قوربان‌و سێ ڕۆژەکەی دوای خۆی[6]، ڕیوایەت کراوە لە ئیبنوعومەرو ئیبنوزوبەیرو ئەبوموساو عەتاو موجاهیدو عیکرمەو سەعیدی کوڕی جوبەیرو ئەبولمالیك‌و ئیبراهیمی نەخەعی‌و یەحیای کوڕی ئەبوکەسیرو حەسەن‌و قەتادەو سوودی‌و زوهری‌و ڕەبیعی کوڕی ئەنەس‌و کەسانی تریشەوە هەر بەو جۆرە[7] لە ئایەتە پیرۆزەکەیشەوە هەر وا دەردەکەوێ کە ئەفەرموێت: ﴿فَمَن تَعَجَّلَ فِي يَوْمَيْنِ فَلَآ إِثْمَ عَلَيْهِ وَمَن تَأَخَّرَ فَلَآ إِثْمَ عَلَيْهِ﴾ هەرکەس دوو ڕۆژی پێش بخا ت گوناهی نایەتە سەر، هەرکەسێکیش دواکەوت گوناهی لەسەر نیە. ئەمە بەڵگەیە لەسەر سێ ڕۆژی دوای جەژنی قوربان کە لە ڕۆژانی تەشریقە. پەیوەندی بەم دەقەوەیە کە خودای مەزن ئەفەرموێت: ﴿وَٱذْكُرُوا۟ ٱللَّهَ فِىٓ أَيَّامٍ مَّعْدُودَٰتٍ﴾ لە ڕۆژانی دیاریکراودا ناوی خوداتان لەبیر نەچێ. یادی خودا لەسەر قوربانیەکان‌و یادە کاتیەکە لە دوای نوێژەکان‌و یادی خودا بە هەمیشەیی‌و لە گشت کاتێکا، دیسان پەیوەندی هەیە بە(الله

---

[1] أحمد(٥/٧٥)، مسلم(٢/٨٠٠).

[2] أحمد(٤/٨٢)، فەرموودەیەکی مونقەتیعە.

[3] أبوداود(٢/٤٨٥)، فەرموودەیەکی باشە(جيد).

[4] الطبري(٤/٢١١).

[5] الطبري(٤/٢١١).

[6] الطبري(٤/٢١٣).

[7] إبن أبي حاتم غ: (٢/٥٤٧-٥٤٩).

أكبر) كردن‌و یادی خودا لە كاتی ڕەجمی شەیتاندا لە هەموو ڕۆژەكانی تەشریقدا، لەو فەرموودەیەشدا كە ئەبوداودو كەسانی تریش ڕیوایەتیان كردووە: (بێگومان تەوافی بەیت‌و ڕاكردنی نێوان سەفاو مەروەو فڕێدانی بەردەكان(ڕەجمی شەیتان) بۆ بەجێهێنانی یادی خودای مەزنە)[1] كاتێ كە خودای مەزن باسی نەفری یەكەم‌و دووهەمی كرد[2] كە بڵاوە كردنی خەڵكە لە دروشمەكانی حەجدا بۆ هەرێم‌و ناوچەكان دوای كۆبوونەوەیان لە دروشمەكان‌و شوێنی وەستانەكاندا ئەفەرموێت: ﴿لِمَنِ اتَّقَىٰ وَاتَّقُوا اللَّهَ وَاعْلَمُوا أَنَّكُمْ إِلَيْهِ تُحْشَرُونَ﴾ لە خودا بترسن‌و خۆپارێز بن، بیشزانن كە هەمووتان لە لای خودا كۆدەكرێنەوە. لە ئایەتێكی تریشدا ئەفەرموێت: ﴿وَهُوَ الَّذِي ذَرَأَكُمْ فِي الْأَرْضِ وَإِلَيْهِ تُحْشَرُونَ﴾[3] هەر ئەویشە كە ئێوەی لەم زەمینە دروس كردووەو هەر لای ئەو كۆدەكرێنەوە.

﴿ وَمِنَ النَّاسِ مَن يُعْجِبُكَ قَوْلُهُ فِي الْحَيَاةِ الدُّنْيَا وَيُشْهِدُ اللَّهَ عَلَىٰ مَا فِي قَلْبِهِ وَهُوَ أَلَدُّ الْخِصَامِ (٢٠٤) وَإِذَا تَوَلَّىٰ سَعَىٰ فِي الْأَرْضِ لِيُفْسِدَ فِيهَا وَيُهْلِكَ الْحَرْثَ وَالنَّسْلَ ۗ وَاللَّهُ لَا يُحِبُّ الْفَسَادَ (٢٠٥) وَإِذَا قِيلَ لَهُ اتَّقِ اللَّهَ أَخَذَتْهُ الْعِزَّةُ بِالْإِثْمِ ۚ فَحَسْبُهُ جَهَنَّمُ ۚ وَلَبِئْسَ الْمِهَادُ (٢٠٦) وَمِنَ النَّاسِ مَن يَشْرِي نَفْسَهُ ابْتِغَاءَ مَرْضَاتِ اللَّهِ ۗ وَاللَّهُ رَءُوفٌ بِالْعِبَادِ (٢٠٧) ﴾

### باسی ژیانی دووڕووەكان

سوودی دەڵێت: ئەم ئایەتانە لەسەر ئەخنەسی كوڕی شورەیقی سەقەفی هاتە خوارەوە هاتە خوارەوە كە هات بۆ لای پێغەمبەری خودا(ﷺ) ئیسلامەتی خۆی ڕاگەیاند، بەڵام لە دڵدا بێ باوەڕ بوو.[4] لە ئیبنوعەبباسەوە دەڵێت: ئەم ئایەتانە لەسەر دەستەیەك لە دووڕووەكان هاتۆنەتە خوارەوە كە قسەیان دەربارەی خوبەیب‌و هاوەڵەكانی دەكرد كە لە(ڕەجیع)كوژران، بە خراپ‌و ناتەواو باسیان دەكردن. خودای مەزن ئەم ئایەتانەی نارده خوارەوە زەمی دووڕووەكان دەكاو ستایشی خوبەیب‌و

[1] أبوداود(٢/٤٤٧)، فەرموودەیەكی بەهێز نی یە، ئەمە لە ج نامەی(شێخی بێژوی) وەرگێڕانی عەبدوڵڵای مەلا محمود وەرگیراوە.

[2] لە حەجدا دوو نەفر هەیە: نەفری یەكەم: بە دەرچوونی حاجی دەگوترێت لە مینا دوای نیوەڕۆی دووهەم ڕۆژی دوای جەژن.

نەفری دووهەم: بە دەرچوونی هەموو حاجیان‌و بەڕێ بوونیان دەگوترێت. دوا نیوەڕۆی ڕۆژی سێهەمی دوای جەژن دوای ڕەمی ئەو ڕۆژەو ڕەمی ڕۆژەكانی تریش ئەگەر نەی كردبوون.

[3] المؤمنون(٧٩).

[4] الطبري(٤/٢٢٩).

هاوەڵەکانی دەکاو ئەفەرموێت: ﴿ وَمِنَ ٱلنَّاسِ مَن يَشْرِى نَفْسَهُ ٱبْتِغَآءَ مَرْضَاتِ ٱللَّهِ ﴾ هی واش لەناو مەردم هەیە بۆ ڕەزای خودا گیان دەبەخشن. وتراوە: ئەوە هەموو دووڕووەکان بە گشتی دەگرێتەوەو هەموو خاوەن باوەڕانیش بە گشتی هەر دەگرێتەوە[1] ئەمە قسەی قەتادەو موجاهیدو ڕەبیعی کوڕی ئەنەس‌و کەسانی تریشەو قسەیەکی ڕاستە. ئیبنوجەریر ڕیوایەتی کردوە لە قورەزیەوە لە نەدفەوە کە بەکالیە لەو کەسانە بوو کە کتێبی دەخوێندەوە، دەڵێت: من ڕەوشتی هەندێ خەڵکی ناو ئەم ئوممەتە دەبینم لەو کتێبەی خودا ناردویەتیە خوارەوە: دەستەیەکن بە هۆی ئاینەوە فێڵ دەکەن بۆ دنیایان، زمانیان لە هەنگوین شیرنترە، دڵیان لە دەرمانی تاڵ تاڵترە. بەرگی مەڕ لەبەردەکەن بۆ خەڵکی دڵیان دڵی گورگە. خودای مەزن ئەفەرموێت: ئەوانە دژی من دەوەستن‌و لەخۆبایی دەبن، سوێندم خواردوە بە خۆم، کە تووشی بەلایەکی وایان دەکەم کە دانشمەند تێدا سەرگەردانە، قورەزی دەڵێت: لە قورئان ورد بومەتەوە. دیم ئەوانە هەر دووڕووەکانن: ﴿ وَمِنَ ٱلنَّاسِ مَن يُعْجِبُكَ قَوْلُهُۥ فِى ٱلْحَيَوٰةِ ٱلدُّنْيَا وَيُشْهِدُ ٱللَّهَ عَلَىٰ مَا فِى قَلْبِهِۦ ﴾ لەم خەڵکەدا هی وا هەیە قسەو گفتی سەبارەت بە ژیانی دنیا بۆ تۆ سەیرو سەرسوڕهێنەرەو لەسەر ئەوەی لە دڵیایە خودا بە شایەت دێنێتەوە. ئەمەی قورەزی دەڵێت حەسەن‌و سەحیحە. بەڵام ئەمەی کە خودای مەزن ئەفەرموێت: ﴿وَيُشْهِدُ ٱللَّهَ عَلَىٰ مَا فِى قَلْبِهِۦ﴾ لەسەر ئەوەی لە دڵیایە خودا بە شایەت ئەگرێ. واتە: موسوڵمانەتی خۆی بۆ خەڵکی دەردەبڕێ، کەچی لە دڵدا بەرانبەر بە خودا دەوەستێ‌و بە خوانەناسی‌و دووڕوویی دژایەتی فەرمانەکانی خودا دەکا. وەك خودای گەورە لەم ئایەتەدا ئەفەرموێت: ﴿ يَسْتَخْفُونَ مِنَ ٱلنَّاسِ وَلَا يَسْتَخْفُونَ مِنَ ٱللَّهِ ﴾[3] شت لە خەڵك دەشارنەوە، خۆ ناتوانن هیچ لە خودا بشارنەوە. ئیبنوئیسحاق ئەم مانایە لە ئیبنوعەبباسەوە ڕیوایەت کراوە[4]. وتراویشە: واتە کاتێ کە ئیسلامەتی خۆی ئاشکرا دەکات بۆ خەڵکی سوێندیش دەخوات و خودا دەکاتە شایەت کە ئەوەی لە دڵیدایە لەگەڵ زمانی وەك یەکە، ئەم مانایە ڕاست‌و دروستە و قسەی عەبدوڕەحمانی کوڕی زەیدی کوڕی ئەسلەمە[5] ئیبنوجەریریش هەر ئەم ڕایەی هەڵبژاردوەو دەڵێ ئیبنوعەبباس‌و موجاهیدیش هەر وایان وتوە(واللە

---

[1] الطبري(٤/٢٣٠).

[2] الطبري(٤/٢٣٢).

[3] النساء(١٠٨).

[4] الطبري(٤/٢٣٠).

[5] الطبري(٤/٢٣٢).

أعلم). کەچی هەر ئەو لە دوژمنایەتی کردندا زۆر سەر سەختە. (الألد) لە زماندا واتە چەوت. ﴿وَتُنذِرَ بِهِۦ قَوْمًا لُّدًّا ﴾[١] کەلێ دوژمنی سەرسەخت بترسێنی. دووڕوویش هەر وایە لە کاتی دوژمنایەتیدا درۆ دەکاو لە هەق لائەداو بە ڕێكو ڕاستی لەگەڵی ناڕواتو بوختان هەڵبەسو لە ڕێ لادەرە وەك لە فەرموودەی سەحیحا هاتوە لە پێغەمبەری خوداوە(ﷺ) کە فەرموویەتی: (نیشانەی دووڕوو سێ شتە: کاتێ قسەی کرد درۆ دەکا. کاتێ بەڵێنی دا ناپاکی دەکا. کاتێ دەمەقاڵەشی کرد خراپ دەدوێ)[٢] بوخاری ڕیوایەتی کردوە لە عائیشەوە کە پێغەمبەر(ﷺ) فەرموویەتی: (ڕق لێبووترین پیاوانێ لە لای خودا ئەو کەسانەن لە دوژمنایەتی کردنا زۆر سەرسەختن)[٣]، پاشان خودای مەزن ئەفەرموێت: ﴿ وَإِذَا تَوَلَّىٰ سَعَىٰ فِى ٱلْأَرْضِ لِيُفْسِدَ فِيهَا وَيُهْلِكَ ٱلْحَرْثَ وَٱلنَّسْلَ ۗ وَٱللَّهُ لَا يُحِبُّ ٱلْفَسَادَ ﴾ هەر کە لە تۆ دوور کەوتەوە، مل لە بەدفەڕی دەنێتو لە زەویدا خراپە دەکاو کێڵگەو ڕەچەڵەك لەناو دەبا، خودا هەرگیز لە بەدفەڕان خۆشی نایە. واتە: ئەو کەسانەی قسە چەوتو کردار خراپن. ئەوە کردارو گفتاریانە، هەرچی بڵێ درۆ دەکا، بۆچوونی بەدفەڕی هەیەو کرداری ناشرینە. مەبەستا لە(السعي) لێرەدا هەوڵدانە. وەك خودای مەزن باسی فیرعەون دەکاو ئەفەرموێت: ﴿ثُمَّ أَدْبَرَ يَسْعَىٰ ﴿٢٢﴾ فَحَشَرَ فَنَادَىٰ ﴿٢٣﴾ فَقَالَ أَنَا۠ رَبُّكُمُ ٱلْأَعْلَىٰ ﴿٢٤﴾ فَأَخَذَهُ ٱللَّهُ نَكَالَ ٱلْءَاخِرَةِ وَٱلْأُولَىٰٓ ﴿٢٥﴾ إِنَّ فِى ذَٰلِكَ لَعِبْرَةً لِّمَن يَخْشَىٰٓ﴾[٤] لە پاشا پشتی تێکردو دەستی کردە هەوڵدان، ئیتر خەڵکی کۆکردەوە جاڕی دا، دەڵێت: من پەروەردگاری هەرە پایە بەرزتانم. ئەوسا خودا گیرۆدەی ئازاری ڕۆژی دواییو دنیای کرد. بێگومان لەم باسەدا پەندێ هەیە بۆ هەرکەسێ کە ئەترسێ. ئەفەرموێت: ﴿يَٰٓأَيُّهَا ٱلَّذِينَ ءَامَنُوٓا۟ إِذَا نُودِىَ لِلصَّلَوٰةِ مِن يَوْمِ ٱلْجُمُعَةِ فَٱسْعَوْا۟ إِلَىٰ ذِكْرِ ٱللَّهِ﴾[٥] ئەی کۆمەڵی خاوەن باوەڕان، هەرکاتێ لە ڕۆژی هەینی، بۆ نوێژی هەینی بانگ ئەدرێ، ئێوە بەپەلە بەرەو یادی خودا بچن. واتە: کە هەینی بانگ ئەدرێ هەوڵ بدەنو بەرەو نوێژی هەینی برۆن. بێگومان پەلە کردنی جەستەیی لە فەرموودەی پێغەمبەرا ڕێی پێ نەدراوە وەك فەرموویەتی: (کاتێ چوون بۆ نوێژ، وا بۆی مەڕۆن پەلەی بۆ بکەن، بە ئارامیو لەسەرخۆیی بۆی بچن)[٦] دیارە دووڕوو هیچ مەبەستێکی نیە

---

[١] مريم(٩٧).

[٢] فتح الباري(١/١١١).

[٣] فتح الباري(٨/٣٦).

[٤] النازعات(٢٢-٢٦).

[٥] الجمعة(٩).

[٦] مسلم(١/٣٢٠).

جگە لە بەدفەڕیو خراپەکاری لە زەویداو لەناو بردنی کشتوکاڵو بەروبومو بەرهەمی ئەو ئاژەڵانەی کە خەڵکی بێ ئەوانە ناژی. موجاهید دەڵێت: کاتێ کە ئەوانە دەستیان دایە خراپەکاریو بەدفەڕی لە زەویدا، خودا باران دەگرێتەوەو بەروبومو کشتوکاڵو بەرهەمی ئاژەڵ لەناو دەچێو نامێنێ ﴿وَٱللَّهُ لَا يُحِبُّ ٱلْفَسَادَ﴾ خودا هەرگیز بەدفەڕانی خۆش ناوێ، واتە: هەرکەسێ ئەو ڕەوشتانەی هەبێ خودا خۆشی ناوێ.

## لە ڕەوشتی دووڕووەکان وەرنەگرتنی ئامۆژگاریە

خودای مەزن ئەفەرموێت: ﴿وَإِذَا قِيلَ لَهُ ٱتَّقِ ٱللَّهَ أَخَذَتْهُ ٱلْعِزَّةُ بِٱلْإِثْمِ﴾ کە پێی وترا: دەبێ ترست هەبێ لە خودا، دەمارزلی زیاتر بەرەو گوناه دەیبا(واتە: کاتێ ئەو بەدکارە ئامۆژگاری بکرێ لەسەر ئەو کردارو گفتاریەو پێی بوترێ لە خوا بترسەو واز لەو کردارو گفتارە خراپانە بێنەو بگەڕێرەوە لەو تاوانو خراپەکاریە، مل ناداو ڕازی نابێ. دەمارگیرو تورە دەبێ بە هۆی ئەو گشت بەدفەڕیەوە کە کردوویەتی. ئەم ئایەتە لەو ئایەتە دەچێ کە خودای مەزن ئەفەرموێت: ﴿وَإِذَا تُتْلَىٰ عَلَيْهِمْ ءَايَـٰتُنَا بَيِّنَـٰتٍ تَعْرِفُ فِى وُجُوهِ ٱلَّذِينَ كَفَرُوا۟ ٱلْمُنكَرَ ۖ يَكَادُونَ يَسْطُونَ بِٱلَّذِينَ يَتْلُونَ عَلَيْهِمْ ءَايَـٰتِنَا ۗ قُلْ أَفَأُنَبِّئُكُم بِشَرٍّ مِّن ذَٰلِكُمُ ۗ ٱلنَّارُ وَعَدَهَا ٱللَّهُ ٱلَّذِينَ كَفَرُوا۟ ۖ وَبِئْسَ ٱلْمَصِيرُ﴾[1] کاتێ نیشانە ئاشکراکانی ئێمەشیان بەسەردا دەخوێنرێتەوە، لە چڕو چاوی خوانەناسەکاندا نیشانەی حاشا دەبینیو لەوانەیە هێرش بەرنە سەر ئەوانەی کە نیشانەی ئێمەیان بەسەردا خوێندونەتەوە. بڵێ: ئایا پێتان بڵێم کە چی لەمە خراپترە؟ ئەو ئاگرەی کە خوا بەڵێنی داوە بەبێ باوەڕان، ئای لەو ئاکامە خراپە. هەر بۆیە لەم ئایەتەدا ئەفەرموێت: ﴿فَحَسْبُهُۥ جَهَنَّمُ ۚ وَلَبِئْسَ ٱلْمِهَادُ﴾ با جێی جەهەنم بێ کە خراپترین جێگەیە. واتە: سزای جەهەنمی بەسە بۆ تۆڵە لێ سەندنی.

## لە ڕەوشتەکانی خاوەن باوەڕی دڵسۆزەکە ڕەزامەندی خودا پێش گشت شتێ دەخا

خودای مەزن ئەفەرموێت: ﴿وَمِنَ ٱلنَّاسِ مَن يَشْرِى نَفْسَهُ ٱبْتِغَآءَ مَرْضَاتِ ٱللَّهِ ۗ وَٱللَّهُ رَءُوفٌۢ بِٱلْعِبَادِ﴾ هی واش لەناو مەردم هەیە بۆ ڕەزای خوا گیان دەبەخشن، خودا لەگەڵ عەبدەکانی خۆی دلۆڤانە. کاتێ خودای گەورە باسی ڕەوشتە خراپەکانی دووڕووەکانی کرد، دێتە سەر باسی ڕەوشتە چاکەکانی خاوەن باوەڕانو ئەفەرموێت: ﴿وَمِنَ ٱلنَّاسِ مَن يَشْرِى نَفْسَهُ ٱبْتِغَآءَ مَرْضَاتِ ٱللَّهِ﴾ هی واش لەناو مەردم هەیە بۆ ڕەزای خوا گیان دەبەخشن. ئیبنوعەبباسو ئەنەسو سەعیدی کوڕی

---

[1] الحج(٧٢).

موسەییبو ئەبوعوسمانی نهدی(النهدی)و عیکرمەو کەسانی تریش دەڵێن: ئەم ئایەتە لەسەر سوهەیبی ڕومی هاتۆتە خوارەوە، ئەوە بوو کاتێ کە موسوڵمان بوو ویستی کۆچ بکات(بۆ مەدینە) خەڵکی(مەککە) نەیانهێشت بە ماڵەکەیەوە کۆچ بکا. وتیان: ئەگەر پێی خۆشە ماڵەکەی واز لێ بێنێو کۆچ بکا، ئەویش ماڵەکەی واز لێ هێنا، ماڵەکەی پێدانو لە دەستیان ڕزگاری بوو. خودای مەزن لەسەر ئەو ئەم ئایەتەی نارده خوارەوە. کۆمەڵێ لەگەڵ عومەری کوڕی خەتاب پێی گەیشتن لە لای حەڕە(الحرّة) پێیان وت: مامەڵەکەت قازانجی کرد ئەویش دەڵێت: ئێوەش خودا بازرگانیەکەتان تووشی زیان نەکا. ئەوە چیە؟ هەواڵیان دایە کە خودا دەربارەی ئەو ئەم ئایەتەی ناردۆتە خوارەوە. ڕیوایەت کراوە کە پێغەمبەری خودا(ﷺ) فەرمووی پێی: (سوهەیب ئەو مامەڵە قازانجی کرد)[1]. مانای ئایەتەکە گشتگیرە هەموو موجاهیدێکی ڕێی خودا دەگرێتەوە، وەك خودای گەورە ئەفەرموێت: ﴿إِنَّ ٱللَّهَ ٱشۡتَرَىٰ مِنَ ٱلۡمُؤۡمِنِينَ أَنفُسَهُمۡ وَأَمۡوَٰلَهُم بِأَنَّ لَهُمُ ٱلۡجَنَّةَۚ يُقَٰتِلُونَ فِي سَبِيلِ ٱللَّهِ فَيَقۡتُلُونَ وَيُقۡتَلُونَۖ وَعۡدًا عَلَيۡهِ حَقّٗا فِي ٱلتَّوۡرَىٰةِ وَٱلۡإِنجِيلِ وَٱلۡقُرۡءَانِۚ وَمَنۡ أَوۡفَىٰ بِعَهۡدِهِۦ مِنَ ٱللَّهِۚ فَٱسۡتَبۡشِرُواْ بِبَيۡعِكُمُ ٱلَّذِي بَايَعۡتُم بِهِۦۚ وَذَٰلِكَ هُوَ ٱلۡفَوۡزُ ٱلۡعَظِيمُ﴾[2] خودا گیانو سامانی باوەڕدارانی کڕیوەو لەباتیاندا دەیانخاتە بەهەشتەوە، باوەڕدارانیش ئەوانەن کە لە ڕێی خودا شەڕ دەکەنو دەکوژنو دەشیانکوژن، لە تەوراتو لە ئینجیلو قورئانیشدا بەڵێنی وەها دراوە. سا کێ لە خوا بۆ پێکهێنانی بەڵێنی وەفادارترە؟ دەسا ئێوە بەو سەودایەتان مزگێنی بە یەکتر بدەن. کە دەسکەوتێکی زۆر گەورەتان دەس کەوتوە. کاتێ کە هیشامی کوڕی عامیر لە نێوان ئەو دوو ڕیزەدا پەلاماریدا، هەندێ لە خەڵکی ناڕەزاییان دەربڕی عومەری کوڕی خەتابو ئەبوهورەیرەو کەسانی تریش وەڵامیان دانەوەو ئەم ئایەتەیان خوێندەوە: ﴿ وَمِنَ ٱلنَّاسِ مَن يَشۡرِي نَفۡسَهُ ٱبۡتِغَآءَ مَرۡضَاتِ ٱللَّهِۚ وَٱللَّهُ رَءُوفُۢ بِٱلۡعِبَادِ ﴾ هی واش لەناو مەردم هەیە بۆ ڕەزای خوا گیان دەبەخشن، خودا لەگەڵ عەبدانی خۆی دلۆڤانە.

﴿ يَٰٓأَيُّهَا ٱلَّذِينَ ءَامَنُواْ ٱدۡخُلُواْ فِي ٱلسِّلۡمِ كَآفَّةٗ وَلَا تَتَّبِعُواْ خُطُوَٰتِ ٱلشَّيۡطَٰنِۚ إِنَّهُۥ لَكُمۡ عَدُوّٞ مُّبِينٞ (٢٠٨) فَإِن زَلَلۡتُم مِّنۢ بَعۡدِ مَا جَآءَتۡكُمُ ٱلۡبَيِّنَٰتُ فَٱعۡلَمُوٓاْ أَنَّ ٱللَّهَ عَزِيزٌ حَكِيمٌ (٢٠٩) ﴾

---

[1] الطبري(٤/٢٤٨).

[2] التوبة(١١١).

## پێویستە ئیسلام بە تەواوی وەرگیرێ

خودای مەزن ئەفەرموێت: ﴿ يَٰٓأَيُّهَا ٱلَّذِينَ ءَامَنُواْ ٱدۡخُلُواْ فِي ٱلسِّلۡمِ كَآفَّةً ﴾ ئەی کۆمەڵی خاوەن باوەڕان هەمووتان بچنە ناو ئیسلامەوە. خودای مەزن فەرمان دەکات بەو عەبدانەی کە باوەڕیان پێی هەیەو بڕواشیان بە پێغەمبەرانی هێناوە کە دەس بگرن بە ئیسلامەوە و پابەند بن بە بڕیارەکانیەوە، کار بە گشت فەرمانەکانی بکەن‌و وازبێنن لە هەموو قەدەغەکراوەکانی بەپێی ئەوتوانایەی خودا پێیداون. عەوفی دەڵێت لە ئیبنوعەبباس‌و موجاهید و تاوس و زەحاك‌و عیکرمەو قەتادەو سوودی‌و ئیبنوزەیدەوە لەم دەقەدا کە خودای مەزن ئەفەرموێت: ﴿ٱدۡخُلُواْ فِي ٱلسِّلۡمِ﴾ واتەئیسلام[1] واتە: بچنە ناو ئیسلام. ﴿كَآفَّةً﴾ هەمووتان، ئەمە قسەی ئیبنوعەبباس‌و موجاهیدو ئەبولعالیەو عیکرمەو ڕەبیعی کوڕی ئەنەس‌و سوودی‌و موقاتیلی کوڕی حەیان‌و قەتادەو زەحاکە[2]، موجاهید دەڵێت: واتە: هەڵسن بە گشت کارێکی چاکە[3] بەتایبەتی ئەوانەی کە بڕوایان هێناوە لە ئەهلی کتێب. وەك ئیبنوئەبی حاتەم ڕیوایەتی کردوە لە ئیبنوعەبباسەوە ﴿ يَٰٓأَيُّهَا ٱلَّذِينَ ءَامَنُواْ ٱدۡخُلُواْ فِي ٱلسِّلۡمِ كَآفَّةً ﴾ ئەی کۆمەڵی خاوەن باوەڕان هەمووتان بچنە ناو ئیسلامەوە. ﴿كَآفَّةً﴾ بە نەسەب خوێندۆتەوە. واتە: ئەی خاوەن باوەڕانی ئەهلی کتێب، چونکە ئەوان لەگەڵ ئەوەیشا داکە خاوەن باوەڕ بوون، پەیڕەوی هەندێ لە فەرمانەکانی تەوراتیان دەکرد کە بۆیان هاتبوو. خودای گەورە فەرمووی: ﴿ٱدۡخُلُواْ فِي ٱلسِّلۡمِ كَآفَّةً﴾[4] هەموو بچنە ناو ئیسلامەوە. واتە: هەموو پەیڕەوی ئاینی موحەممەد(ﷺ) بکەن‌و هیچی واز لێنەهێنن، تەنیا ئەوەتان بەسە کە بڕواتان بە تەورات‌و ئەوەی تیایەتی هەبێ. پاشان خودای مەزن ئەفەرموێت: ﴿وَلَا تَتَّبِعُواْ خُطُوَٰتِ ٱلشَّيۡطَٰنِ﴾ پێ مەنێنە جێ پای شەیتان. واتە: کارێ بکەن کە خودا پێی خۆشە، دورکەونەوە لەو شتانەی کە شەیتان فەرمانتان پێدەکات ﴿إِنَّمَا يَأۡمُرُكُم بِٱلسُّوٓءِ وَٱلۡفَحۡشَآءِ وَأَن تَقُولُواْ عَلَى ٱللَّهِ مَا لَا تَعۡلَمُونَ﴾[5] ئەو هەر فەرمانتان پێدەدا: کاری پیس‌و زۆر نالەبار ڕەچاو کەن‌و شتانی وا دەربارەی خودا بڵێن کە هەر

---

[1] الطبري(٤/٢٥٢)، إبن أبي حاتم غ: (٢/٥٨٤-٥٨٥).

[2] إبن أبي حاتم غ: (٢/٥٨٦-٥٨٨).

[3] إبن أبي حاتم غ: (٢/٥٩١).

[4] إبن أبي حاتم غ: (٢/٥٨٢).

[5] البقرة(١٦٩).

ئاگاشتان لێ نیە. ئەفەرموێت: ﴿إِنَّمَا يَدْعُواْ حِزْبَهُۥ لِيَكُونُواْ مِنْ أَصْحَٰبِ ٱلسَّعِيرِ﴾[1] ئەو هەر بۆیە دارو دەستەی بانگ دەکات تا لە یارانی ئاگربن. هەر بۆیە خودای گەورە ئەفەرموێت: ﴿إِنَّهُۥ لَكُمْ عَدُوٌّ مُّبِينٌ﴾ ئاشکرایە کە شەیتان دوژمنتانە. پاشان ئەفەرموێت: ﴿فَإِن زَلَلْتُم مِّنۢ بَعْدِ مَا جَآءَتْكُمُ ٱلْبَيِّنَٰتُ﴾ پاش ئەوەی ئەو بەڵگە ئاشکرایانەتان بۆ هاتوە ئەگەر بێتو هەڵخلیسکێن، واتە: لە ڕێی ڕاست ترازانو لاتان،دا دوای ئەو بەڵگە ئاشکرانە. ﴿فَٱعْلَمُوٓاْ أَنَّ ٱللَّهَ عَزِيزٌ حَكِيمٌ﴾ دەبێ ئەوەندە بزانن کە خوا خاوەن تواناو لە کارزانە. خاوەن توانایە لە تۆڵە سەندنا، هیچ کەس ناتوانێ لە دەستی ڕابکاودەس لەکاری وەردا. ﴿حَكِيمٌ﴾ لەکارزانە لەبڕیارەکانیدا،هەرچی بوێ دەیکات. هەر بۆیە ئەبولعالیەوقەتادەوڕەبیعی کوڕی ئەنەس دەڵێن: ﴿عَزِيزٌ﴾ لە تۆڵەسەندنا ﴿حَكِيمٌ﴾ لە فەرمانیدا[2].

﴿هَلْ يَنظُرُونَ إِلَّآ أَن يَأْتِيَهُمُ ٱللَّهُ فِى ظُلَلٍ مِّنَ ٱلْغَمَامِ وَٱلْمَلَٰٓئِكَةُ وَقُضِىَ ٱلْأَمْرُ ۚ وَإِلَى ٱللَّهِ تُرْجَعُ ٱلْأُمُورُ ﴿٢١٠﴾﴾

### هاندان بۆ دوانەکەوتن لە باوەڕ هێنان

خودای مەزن هەڕەشە لەخوانەناسان دەکات بەڕەوانە کردنی موحەممەد(ﷺ)و ئەفەرموێت: ﴿هَلْ يَنظُرُونَ إِلَّآ أَن يَأْتِيَهُمُ ٱللَّهُ فِى ظُلَلٍ مِّنَ ٱلْغَمَامِ وَٱلْمَلَٰٓئِكَةُ﴾ ئایا ئەوان چاوەنواڕن خوداو فریشتەکانی دا لەناو چەند پارچە هەورێکی سپیدا بێنە لایان. واتە: لە ڕۆژی قیامەتادا خوداو فریشتەکان بێنە لایانو هەموو شتێ لە نێوان خەڵکیدا لە سەرەتاوە هەتا دواین کەس جیا بکرێتەوە بڕیاری تێدا بدرێ، هەرکەسەو بەپێی کرداری پاداشتی خۆی وەردەگرێ، ئەگەر چاك بوۆ بە چاکەو ئەگەر خراپیش بوو تۆڵەی لێ بسێنرێ. هەر بۆیە خودای گەورە ئەفەرموێت: ﴿وَقُضِىَ ٱلْأَمْرُ ۚ وَإِلَى ٱللَّهِ تُرْجَعُ ٱلْأُمُورُ﴾ کارەکە کۆتایی پێ بێت؟ هەموو کارێك هەر بەرەو خودا دێتەوە. وەك خودای مەزن لە ئایەتی تردا ئەفەرموێت: ﴿كَلَّآ إِذَا دُكَّتِ ٱلْأَرْضُ دَكًّا دَكًّا ﴿٢١﴾ وَجَآءَ رَبُّكَ وَٱلْمَلَكُ صَفًّا صَفًّا ﴿٢٢﴾ وَجِاْىٓءَ يَوْمَئِذٍۭ بِجَهَنَّمَ ۚ يَوْمَئِذٍ يَتَذَكَّرُ ٱلْإِنسَٰنُ وَأَنَّىٰ لَهُ ٱلذِّكْرَىٰ﴾[3] نابێ وابێ، هەرکاتێ زەمین زۆر بە سەختی تێکشکێنرێ، فەرمانی پەروەردگارت بێ‌و فریشتەکانیش پۆل پۆل ڕیز بوەستن، دۆزەخیش بێننە

---

[1] فاطر(٦).

[2] إبن أبي حاتم غ: (٢/٥٩١).

[3] الفجر(٢١-٢٣).

پێشەوە، ئەو ڕۆژە مرۆڤ خۆی وەبیر دێتەوە، بەڵام ئەو وەبیر هاتنەوە چ سوودێکی پێ دەگەیەنێ؟

ئەفەرموێت: ﴿ هَلْ يَنظُرُونَ إِلَّآ أَن تَأْتِيَهُمُ ٱلْمَلَٰٓئِكَةُ أَوْ يَأْتِىَ أَمْرُ رَبِّكَ ﴾[1] ئایا ئەو خوانەناسانە جگە لەوە کە فریشتە بێتە لایان، یان فەرمانی پەروەردگارتیان پێ بکات چاوەنوارێکی تریان هەیە؟

ئەبوجەعفەری رازی دەڵێت لە ڕەبیعی کوڕ ئەنەسەوە لە ابوالعالیەوە: ﴿هَلْ يَنظُرُونَ إِلَّآ أَن يَأْتِيَهُمُ ٱللَّهُ فِى ظُلَلٍ مِّنَ ٱلْغَمَامِ وَٱلْمَلَٰٓئِكَةُ ﴾ ئایا ئەوان چاوەنوارن خوداو فریشتەکانی خودا لەناو چەند هەورێکی سپیدا بێنە لایان. دەڵێن: فریشتەکان لەناو چەند هەورێکی سپیدا دێن، خودای مەزنیش چۆن بیەوێ‌و مەیلی لێ بێ دێت.[2] ئەوە لە هەندێ خوێندنەوەدا هاتوە ﴿هَلْ يَنظُرُونَ إِلَّآ أَن يَأْتِيَهُمُ ٱللَّهُ فِى ظُلَلٍ مِّنَ ٱلْغَمَامِ﴾ ئایا ئەوان چاوەنوارن خوداو فریشتەکانی خودا لەناو چەند هەورێکی سپیدا بێنە لایان.

ئەم ئایەتە وەك ئەو ئایەتە وایە کە خودای مەزن ئەفەرموێت: ﴿ وَيَوْمَ تَشَقَّقُ ٱلسَّمَآءُ بِٱلْغَمَٰمِ وَنُزِّلَ ٱلْمَلَٰٓئِكَةُ تَنزِيلًا ﴾[3] ڕۆژێکیش ئاسمان بەهەورێکی سپی لەت بێ‌و دەقڵیشێ فریشتەکان(بە کۆمەڵ) بەرەو زەمین بەڕێ دەکەون.

﴿سَلْ بَنِىٓ إِسْرَٰٓءِيلَ كَمْ ءَاتَيْنَٰهُم مِّنْ ءَايَةٍۭ بَيِّنَةٍ ۗ وَمَن يُبَدِّلْ نِعْمَةَ ٱللَّهِ مِنۢ بَعْدِ مَا جَآءَتْهُ فَإِنَّ ٱللَّهَ شَدِيدُ ٱلْعِقَابِ ﴿٢١١﴾ زُيِّنَ لِلَّذِينَ كَفَرُوا۟ ٱلْحَيَوٰةُ ٱلدُّنْيَا وَيَسْخَرُونَ مِنَ ٱلَّذِينَ ءَامَنُوا۟ ۘ وَٱلَّذِينَ ٱتَّقَوْا۟ فَوْقَهُمْ يَوْمَ ٱلْقِيَٰمَةِ ۗ وَٱللَّهُ يَرْزُقُ مَن يَشَآءُ بِغَيْرِ حِسَابٍ ﴿٢١٢﴾﴾

## سزای ئەوانەی پێ نەزانن بە چاکەی خوداو گاڵتە بە خاوەن باوەڕان دەکەن

خودای مەزن ئەفەرموێت: ﴿سَلْ بَنِىٓ إِسْرَٰٓءِيلَ كَمْ ءَاتَيْنَٰهُم مِّنْ ءَايَةٍۭ بَيِّنَةٍ﴾ لە بەرەی ئیسرائیل پرسە، چەند نیشانەی ئاشکرامان داوە بەوان؟ خودای مەزن باسی نەوەی ئیسرائیل دەکات، کە چەندین نیشانەی ئاشکرایان لەگەڵ مووسادا(سەلامی خوای لێ بێ) دیوە، لەسەر ڕاستی ئەو پەیامەی کە بۆی هێناون، وەك درەوشانەوەی دەستی‌و عەساکەی‌و لەت کردنی دەریاو لێدانی لە بەردەکەو سێبەر کردنی هەور لە سەریان لە زۆری گەرماداو ناردنی شەلاقەو گەزۆو زۆرێکی تر یش لە نیشانەی ئاشکرا لەسەر دەستەڵاتی خودای بە تواناو ڕاستی ئەو موعجیزانەی کە لە ژێر دەستی مووسادا(سەلامی خوای لێ بێ) هاتە دی. لەگەڵ ئەمەیشدا زۆر لە نەوەی ئیسرائیل شوێنی نەکەوتن‌و پشتیان تێدەکرد.

---

[1] النحل(٣٣).

[2] الطبري(٤/٢٦٤).

[3] الفرقان(٢٥).

بەهرەی خودایان بە خوانەناسی گۆڕیەوە. واتە: لە جێی خواناس بوونە خوانەناس‌و پشتیان تێکرد. ﴿وَمَن يُبَدِّلْ نِعْمَةَ ٱللَّهِ مِنۢ بَعْدِ مَا جَآءَتْهُ فَإِنَّ ٱللَّهَ شَدِيدُ ٱلْعِقَابِ﴾ هەرکەس چاکەی لەگەڵ بکەین‌و پێ نەزانێ، یا بزانێ خودا لە سزای پێ نەزانان توندو تیژە. وەك خودای گەورە باسی خوانەناسانی قورەیش دەکات‌و ئەفەرموێت: ﴿أَلَمْ تَرَ إِلَى ٱلَّذِينَ بَدَّلُوا۟ نِعْمَتَ ٱللَّهِ كُفْرًا وَأَحَلُّوا۟ قَوْمَهُمْ دَارَ ٱلْبَوَارِ ﴿٢٨﴾ جَهَنَّمَ يَصْلَوْنَهَا ۖ وَبِئْسَ ٱلْقَرَارُ﴾[1] ئایا نەتدی ئەو کەسانەی ناشوکریان لە بەرانبەر چاکەی خودادا کردووەو گەلی خۆیان بەرەو هەڵدێری زۆر گران ڕەتاندوە، لە جەهەنمدا هەڵدەبرژێن، پیسترین شوێنیان هەیە؟ پاشان خودای گەورە ئەفەرموێت: ﴿ زُيِّنَ لِلَّذِينَ كَفَرُوا۟ ٱلْحَيَوٰةُ ٱلدُّنْيَا وَيَسْخَرُونَ مِنَ ٱلَّذِينَ ءَامَنُوا۟ ۘ وَٱلَّذِينَ ٱتَّقَوْا۟ فَوْقَهُمْ يَوْمَ ٱلْقِيَـٰمَةِ﴾ ژینی دنیا بۆ ئەوانەی خوانەناسن ئامادەو ڕازاوەتەوەو گەمەی خۆیان بە خاوەن باوەڕان دەکەن، کەچی لەخواترسەکان ڕۆژی قیامەت لەسەرووئەوانەوەن. خودای گەورە لێرەدا باسی جوانی‌و شیرین کردن‌و ڕازاندنەوەی دنیا دەکات بۆ ئەو خوانەناسانەی کە ئارەزوی دەکەن‌و دڵیان پێی خۆش دەبێ‌و سامانی تێدا کۆدەکەنەوەو ڕێگەش نادرێن خەرج بکرێ لەو شوێنەدا کە فرمان دراوە خەرج بکرێ‌و ببێتە هۆی ڕەزامەندی خودا لێیان، گاڵتە بەو خاوەن باوەڕانە دەکەن کە بەو کارەی ئەوان ڕازی نین، ئەو سامانەیش خودا پێی داون دەیبەخشن بەپێی فەرمانی پەروەردگاریان‌و ڕەزامەندی ئەو. بۆیە پلەی بەرزو شوێنی باشیان لە ڕۆژی قیامەتدا بۆ دیاری کراوەو لەسەر ووئەو خوانەناسانەوەن لە کاتی زیندوو کردنەوەو کۆکردنەوەو بەڕێ کردنیان لە شوێنی بەرزدا جێگیر دەکرێن. خوانەناسانیش لە نزمترین شوێنی جەهەنمدا هەر دەمێننەوە. هەر بۆیە خودای گەورە ئەفەرموێت: ﴿وَٱللَّهُ يَرْزُقُ مَن يَشَآءُ بِغَيْرِ حِسَابٍ﴾ خودا بۆ هەرکەسێ حەز بکات، بێ ژمارە ڕۆزی دەنێرێ. واتە: خودا ڕۆزی ئەدا بە هەرکەسێ خۆی مەیلی لێ بێ، ئەوەندەی پێ دەبەخشێ لە ژمارە نەیەت لە دنیاو لە قیامەتدا. وەك لەم فەرموودەدا هاتوە: (ئەی نەوەی ئادەم، ببەخشە پێت دەبەخشم)[2] پێغەمبەری خودا(ﷺ) فەرموویەتی: (بیلال ببەخشە، مەترسە لە کەم بوونەوە لەلایەن خاوەنی عەرشەوە)[3] خودای مەزن ئەفەرموێت: ﴿وَمَآ أَنفَقْتُم مِّن شَىْءٍ فَهُوَ يُخْلِفُهُۥ﴾[4] ئێوە هەر شتێك ببەخشن، خودا جێگەی پڕ دەکاتەوە بۆتان. وە لە فەرموودەی سەحیحشدا هاتوە: (دوو فریشتە لە ئاسمانەوە

---

[1] ابراهیم(٢٨-٢٩).

[2] الخمیدي(٢/٤٥٩)، سەحیحە.

[3] الطبراني(١٠/١٩٢)، سەنەدەکانی لاوازە.

[4] سبأ(٣٩).

لە بەیانی هەموو ڕۆژێکدا دێنە،خوارەوە یەکێکیان دەڵێ: خودایە ئەوەی خێر دەکات بۆی پڕ بکەرەوە. ئەوی تریان دەڵێ: خودایە ئەوەی دەست دەگرێتەوە(داراییەکەی) لەناو ببە)[1] هەروەهاله فەرموودەی سەحیحدا هاتوە: (نەوەی ئادەم دەڵێت: دارایەکەم، دارایەکەم، ئایا جگە لەوەت هە بووە کە خواردوتەو لەناوت داوەو لەبەرت کردوەو کۆنت کردوەو(دڕاندوتە)و بەخشیوتەو بەڕێت کردوە. ئەوەی جگە لەمانەیە ڕۆشتوەو بۆ خەڵکی ماوەتەوە)[2] لە موسنەدی ئیمامی ئەحمەددا هاتوە لە پێغەمبەری خوداوە(ﷺ) کە فەرموویەتی: (ئەم دنیا ماڵی کەسێکە ماڵی نەبێ، سامانی کەسێکە سامانی نەبێ، بۆی کۆدەکاتەوە کەسێ کە ئاوەزی نەبێ)[3].

﴿كَانَ ٱلنَّاسُ أُمَّةً وَٰحِدَةً فَبَعَثَ ٱللَّهُ ٱلنَّبِيِّـۧنَ مُبَشِّرِينَ وَمُنذِرِينَ وَأَنزَلَ مَعَهُمُ ٱلْكِتَٰبَ بِٱلْحَقِّ لِيَحْكُمَ بَيْنَ ٱلنَّاسِ فِيمَا ٱخْتَلَفُوا۟ فِيهِ ۚ وَمَا ٱخْتَلَفَ فِيهِ إِلَّا ٱلَّذِينَ أُوتُوهُ مِنۢ بَعْدِ مَا جَآءَتْهُمُ ٱلْبَيِّنَٰتُ بَغْيًۢا بَيْنَهُمْ ۖ فَهَدَى ٱللَّهُ ٱلَّذِينَ ءَامَنُوا۟ لِمَا ٱخْتَلَفُوا۟ فِيهِ مِنَ ٱلْحَقِّ بِإِذْنِهِۦ ۗ وَٱللَّهُ يَهْدِى مَن يَشَآءُ إِلَىٰ صِرَٰطٍ مُّسْتَقِيمٍ ﴿٢١٣﴾﴾

## کێشە دروس تکردن دوای هاتنی زانیاری بەڵگەیە لەسەر ئیرەیی و گومڕایی

﴿كَانَ ٱلنَّاسُ أُمَّةً وَٰحِدَةً فَبَعَثَ ٱللَّهُ ٱلنَّبِيِّـۧنَ مُبَشِّرِينَ وَمُنذِرِينَ وَأَنزَلَ مَعَهُمُ ٱلْكِتَٰبَ بِٱلْحَقِّ لِيَحْكُمَ بَيْنَ ٱلنَّاسِ فِيمَا ٱخْتَلَفُوا۟ فِيهِ ۚ وَمَا ٱخْتَلَفَ فِيهِ إِلَّا ٱلَّذِينَ أُوتُوهُ مِنۢ بَعْدِ مَا جَآءَتْهُمُ ٱلْبَيِّنَٰتُ بَغْيًۢا بَيْنَهُمْ﴾ لە پێشدا مەردم هەمووی چینو بەرەیەك بوون. خودا پێغەمبەرانی نارد مژدەدەرو ترسێنەر بن، کتێبی ڕاستو ڕەواشی لەگەڵ ناردن تا ئەو شتەی بوونە بنەمای کێشەیان، بۆیان یەکالا بکەنەوەو پێکیان بێنن، هەر ئەوانەش بۆ یەکتریان نەدەسەڵماند کە لە پێشدا کتێب بۆ ئەوان هاتبوو، بەڵگەی ئاشکرایان لابوو. بەڵام ئیرەیی ناو خۆیان کارێکی وای کرد پێك نەیەن. ئیبنوجەریر ڕیوایەتی کردوە لە ئیبنوعەبباسەوە دەڵێت: نێوان نووحو ئادەم(سەلامی خوایان لێ بێ) دە سەدە بووە، هەموویان لەسەر شەریعەتێکی ڕاست بوون، کێشەیان لە نێواندا پەیدا بوو،خودا پێغەمبەرانی بۆ ناردن مژدەدەرو ترسێنەر بن بۆیان. لە خوێندنەوەی عەبدوڵلادا هەر بەو شێوەیە هاتووە: (كان الناس أُمةً واحدة فأختلفوا)[4] لە پێشدا مەردم هەمووی یەك چینو بەرە بوون، کێشە لە نێوانیاندا پەیدا بوو. حاکمیش لە موستەدرەکەکەیدا ڕیوایەتی کردوە[5] پاشان دەڵێت: سەنەدەکانی سەحیحە. ئەبوجەعفەری ڕازی هەر بەو جۆرە ڕیوایەتی

---

[1] فتح الباري(٣/٢٥٧).

[2] مسلم(٤/٢٢٧٣).

[3] أحمد(٦/٧١)، فەرموودەیەکی لاوازە.

[4] الطبري(٣/٢٥٧).

[5] الحاكم(٢/٥٤٦).

کردوە لە ئەبولعالیەوە لە ئوبەیی کوڕی کەعبەوە کە وا دەیخوێندەوە: (كان الناس أمةً واحدة فأختلفوا فبعث الله النبيين مبشرين ومنذرين)[1] عەبدوڕەزاق دەڵێت: موعەمەر هەواڵی پێداین لە قەتادەوە لەم دەقەدا کە خودای گەورە ئەفەرموێت: ﴿كَانَ ٱلنَّاسُ أُمَّةً وَٰحِدَةً﴾ لە پێشدا مەردم هەمووی لە چێن و بەرەیەك بوون. دەڵێت: هەموو لەسەر ڕاستەڕێ بوون ﴿فَبَعَثَ ٱللَّهُ ٱلنَّبِيِّـۧنَ﴾ خودا پێغەمبەرانی نارد. یەکەم پێغەمبەرێ کە ڕەوانە کرا نووح بوو،[2] عەبدوڕەزاق ڕیوایەتی کردوە لە ئەبوهورەیرەوە لەم دەقەدا کە خودای مەزن ئەفەرموێت: ﴿فَهَدَى ٱللَّهُ ٱلَّذِينَ ءَامَنُواْ لِمَا ٱخْتَلَفُواْ فِيهِ مِنَ ٱلْحَقِّ بِإِذْنِهِۦ﴾ ئیترخودا بەئیزنی خۆی ڕێگەی ڕاستی نیشانی باوەڕداران داو تێیگەیاندن. پێغەمبەر(ﷺ) فەرموویەتی: (ئێمە لە دوا ئاینەکان و لەیەکەمەکانین لە ڕۆژی قیامەتدا، وە ئێمە یەکەم کەسین لە چوونە بەهەشتدا، ئەگەر چی ئەوان لە پێش ئێمەدا کتێبیان پێدراوە، ئێمە دوای ئەوان پێمان دراوە. خودای مەزن ڕێگەی نیشانی ئێمە دا لەو هەقەدا ئەوان کێشەیان لەسەری هەبوو بە ئیزنی خۆی. ئەمە ئەو ڕۆژەیە کە کێشەیان تێدا هەبوو خودا ئێمەی تێدا شارەزا کرد، مەردم لەمەدا شوێن کەوتووی ئێمەن. سبەی بۆ جوولەکەیەو دوو سبەی بۆ مەسیحیەکانە)[3] ئیبنووەهەبی دەڵێت لە عەبدوڕەحمانی کوڕی زەیدی کوڕی ئەسلەم لە باوکیەوە لەم دەقەدا کە خودای گەورە ئەفەرموێت: ﴿فَهَدَى ٱللَّهُ ٱلَّذِينَ ءَامَنُواْ لِمَا ٱخْتَلَفُواْ فِيهِ مِنَ ٱلْحَقِّ بِإِذْنِهِۦ﴾ ئیتر خودا بە ئیزنی خۆی ڕێگەی ڕاستی نیشان باوەڕداران داو تێی گەیاندن ئەو کێشەیە لەبەر چی کرا، دەڵێت: کێشەکەیان لە نێواندا پەیدا بوو لەسەر ڕۆژی هەینی، جوولەکە ڕۆژی شەممەیان وەرگرت و مەسیحیەکانیش ڕۆژی یەك شەممەیان هەڵبژارد، خودای مەزن ئوممەتی موحەممەدی(ﷺ)ڕێنماییکرد بۆ ڕۆژی هەینی. هەروەهاکێشەیان بوو لەسەر ڕووگە مەسیحیەکان ڕوویان لە خۆرهەلات کرد، جوولەکەیش ڕووی لە قودسی پیرۆز کرد، خودای مەزن ئوممەتی موحەممەدی(ﷺ) شارەزا کرد بۆ ڕووکردنەکەعبە. کێشەیان لەسەر نوێژ کردن هەبوو، هەیان بوو ڕکوعی دەبردو سوژدەی نەدەبرد. هەشیان بوو سوژدەی دەبردو ڕکوعی نەدەبرد. هی واشیان هەبوو نوێژی دەکردو بە ڕێگەوەدەڕۆشت، خودای مەزن لەوەیشدا ئوممەتی موحەممەدی(ﷺ) شارەزا کرد بۆ سەر هەق. لە ڕۆژوو گرتندا ناکۆك بوون، هەیانبوو هەندێ لە ڕۆژ بەڕۆژو دەبوو هی وایان هەبوو لە هەندێ خواردن ڕۆژوی دەگرت. خودای مەزن ئوممەتی موحەممەدی(ﷺ) شارەزاکرد بۆسەرهەق

---

[1] الطبري(٤/٧٨).

[2] عبدالرزاق(١/٨٢).

[3] عبدالرزاق(١/٨٢)، سەحیحە.

لەوەیشدا. کێشەیان هەبوو دەربارەی ئیبراهیم (سەلامی خوای لێبێ)، جوولەکەکان دەیان وت: (ئیبراهیم) جوولەکە بووە. مەسیحیەکان دەیان وت: مەسیحی بووە. خودا کردیە خواناس‌و موسوڵمان.خوای مەزن ئوممەتی موحەممەدی(ﷺ) شارەزا کرد بۆ سەر هەق لەوەیشدا. کێشەیان لەسەر عیسا(سەلامی خوای لێ بێ) هەبوو، جوولەکە بڕوایان پێ نەهێناو بوختانێکی گەورەیان بۆ دایکی هەڵبەست. مەسیحیەکانیش کردیان بە خوداو کوڕی خودا. خودای مەزنیش کردیە ڕوحی خۆیی‌و وتەی خۆی. خوای مەزن ئوممەتی موحەممەدی(ﷺ) شارەزا کرد بۆ سەر هەق لەوەیشدا[1]. ﴿بِإِذْنِهِۦ﴾ بە ئیزنی خودا. ئیبنوجەریر دەڵێت: بە ئاگاداری خودا بەوان، بەوەی کە ڕێگای نیشاندان بۆ سەر ڕێی ڕاست[2]. ﴿وَٱللَّهُ يَهْدِى مَن يَشَآءُ إِلَىٰ صِرَٰطٍ مُّسْتَقِيمٍ﴾ خودا بۆ هەر کەس حەز بکات شارەزای ڕاستە ڕێی دەکا. واتە: بڕیارو فەرمان هەر هی خودایە. لە سەحیحی بوخاری‌و موسلیمدا هاتوە لە عائیشەوە: کە پێغەمبەری خودا(ﷺ) کاتێ هەڵسایە لە شەودا نوێژ بکا: ئەیفەرموو: (ئەی خودایە پەروەردگاری جوبرەئیل‌و میکائیل‌و ئیسرافیل، دیهێنەری ئاسمانەکان‌و زەمین، ئاگاداری نادیارو دیارەکان، تۆ فەرمانڕەوایی دەکەی لە نێوان عەبدەکاندا لەسەر ئەوەی کێشەیان تێدا بوو. شارەزام بکە لەوەی کێشەی لەسەرە لەو هەقە بە ئیزنی خۆت، بێگومان تۆ مەیلت لە هەرکەس بێ شارەزای دەکەی بۆ ڕاستە ڕێ)[3] وە لە دوعایەکی مەئسوریشدا هاتوە: (ئەی خودایە هەقمان بە هەق نیشاندە، وامان لێبکە شوێنی بکەوین، پڕوپوچمان بە پڕوپوچ نیشابدە، وامان لێبکە لێی بە دوور بین، وامان لێمەکە لێمان تێکبچێ‌و گومڕا ببین. بمانکە بە پێشەوای خۆپارێزان)[4].

﴿أَمْ حَسِبْتُمْ أَن تَدْخُلُوا۟ ٱلْجَنَّةَ وَلَمَّا يَأْتِكُم مَّثَلُ ٱلَّذِينَ خَلَوْا۟ مِن قَبْلِكُم ۖ مَّسَّتْهُمُ ٱلْبَأْسَآءُ وَٱلضَّرَّآءُ وَزُلْزِلُوا۟ حَتَّىٰ يَقُولَ ٱلرَّسُولُ وَٱلَّذِينَ ءَامَنُوا۟ مَعَهُۥ مَتَىٰ نَصْرُ ٱللَّهِ ۗ أَلَآ إِنَّ نَصْرَ ٱللَّهِ قَرِيبٌ (٢١٤)﴾

## سەرکەوتن‌و چوونە بەهەشت وە دەس نایە دوای تاقیکردنەوەو هەڵاوێران نەبێ

خودای مەزن ئەفەرموێت: ﴿أَمْ حَسِبْتُمْ أَن تَدْخُلُوا۟ ٱلْجَنَّةَ﴾ ئایا ئێوە لاتان وایە(بە ئاسانی) دەچنە بەهەشت؟ لە پێش ئەوەدا تاقی بکرێنەوەو دەرکەون وەك گەلە پێشوەکان تاقی کرانەوەو دەرکەوتن، هەروا لە خۆتانەوە بچنە بەهەشت؟ ﴿وَلَمَّا يَأْتِكُم مَّثَلُ ٱلَّذِينَ خَلَوْا۟ مِن قَبْلِكُم ۖ مَّسَّتْهُمُ ٱلْبَأْسَآءُ

---

[1] الطبري(٤/٢٨٤).

[2] الطبري(٤/٢٨٦).

[3] أنفرد بإخراجه مسلم(١/٥٣٤).

[4] تخريج الاحياء(٢/١٤١٨).

﴿وَٱلضَّرَّآءُ﴾ کەچی هێشتا ئەوەی بەسەر پێشینانتاندا هاتووە، بەسەر ئێوە نەهاتووە، ئەوان تووشی گەلێ تەنگانەو ئازارو نەداریو چەوسانەوەو کارەسات هاتن. ئیبنومەسعودو ئیبنوعەبباسو ئەبولعالیەو موجاهیدو سەعیدی کوڕی جوبەیرو موڕەی هەمەدانیو حەسەنو قەتادەو زەححاکو ڕەبیعو سوودیو موقاتیلی کوڕی حەیان دەڵێن: ﴿ٱلۡبَأۡسَآءُ﴾ هەژاری.[1] ئیبنوعەبباس دەڵێت: ﴿وَٱلضَّرَّآءُ﴾ نەخۆشیو بیماری. ﴿وَزُلۡزِلُواْ﴾ زۆر بە توندی تەکان دران لە ترسی دوژمنو تاقیکردنەوەیەکی گەورە هاتە ڕێگەتان وەك لە فەرموودەی سەحیحا هاتوە کەخەبابی کوڕی ئەرەت دەڵێت: وتمان ئەی پێغەمبەری خودا(ﷺ) ئایا داوای سەرکەوتنمان بۆ ناکەی؟ ئایا بۆمان ناپاڕێیتەوە لە خودا؟ ئەویش فەرمووی: (بەڕاستی باوەڕدارانی پێش ئێوە کەسی وایان بووە مشاریان لەسەر سەری داناوە بۆ خوارەوە تا هەردوو قاچی کردوویانە بە دوو لەتەوە، ئەو سزایە وازی پێنەهێناوە لە ئاینەکەی یان بە شانەی ئاسن دایان هێناوەو گۆشتو ئێسقانەکەیان لە یەك جیا کردۆتەوە، ئەو سزایەش وازی پێنەهێناوە لە ئاینەکەی) پاشان فەرمووی: (سوێند بە خوا ئەم فەرمانەی خۆی تەواو دەکات هەتا(وای لێ دێ) سوار لە سەنعاوە دەڕوا بۆ(حەزرەمەوت)لە خوا نەبێ لە هیچ ناترسێو گورگو مەڕ پێکەوە دەبن،[2] بەلام ئێوە گەلێکن پەلەتانە)[3] خودای مەزن ئەفەرموێت: ﴿الٓمٓ ۝١ أَحَسِبَ ٱلنَّاسُ أَن يُتۡرَكُوٓاْ أَن يَقُولُوٓاْ ءَامَنَّا وَهُمۡ لَا يُفۡتَنُونَ ۝٢ وَلَقَدۡ فَتَنَّا ٱلَّذِينَ مِن قَبۡلِهِمۡۖ فَلَيَعۡلَمَنَّ ٱللَّهُ ٱلَّذِينَ صَدَقُواْ وَلَيَعۡلَمَنَّ ٱلۡكَٰذِبِينَ﴾[4] الف، لام، میم، ئایا مەردم لایان وایە هەر کە بڵێن: ئێمە باوەڕمان هێناوە، ئیتر وازیان لێ دەهێنرێو تووشی هیچ تاقیکردنەوەیەك نابن؟ ئێمە ئەوانەی پێش لەمانەمان تاقی کردۆتەوە. بێگومان خودا ئەوانەی کە ڕاستیان وت، ئەوانەشی کە درۆزنن دیاری دەکا. لە ڕۆژی ئەحزابدا زۆر شت دەرکەوتو ئاشکرا بوو بۆ هاوەڵەکانی پێغەمبەر(ﷺ)(ڕەزای خوایان لێ بێ) وەك خودای گەورە ئەفەرموێت: ﴿إِذۡ جَآءُوكُم مِّن فَوۡقِكُمۡ وَمِنۡ أَسۡفَلَ مِنكُمۡ وَإِذۡ زَاغَتِ ٱلۡأَبۡصَٰرُ وَبَلَغَتِ ٱلۡقُلُوبُ ٱلۡحَنَاجِرَ وَتَظُنُّونَ بِٱللَّهِ ٱلظُّنُونَا۠ ۝١٠ هُنَالِكَ ٱبۡتُلِيَ ٱلۡمُؤۡمِنُونَ وَزُلۡزِلُواْ زِلۡزَالٗا شَدِيدٗا ۝١١ وَإِذۡ يَقُولُ ٱلۡمُنَٰفِقُونَ وَٱلَّذِينَ فِي قُلُوبِهِم مَّرَضٞ مَّا وَعَدَنَا ٱللَّهُ وَرَسُولُهُۥٓ إِلَّا غُرُورٗا﴾[5] لەو کاتەدا لە ژوورو لە ژێرەوە بۆتان هاتن، چاوتان ڕەشکەو پێشکەی دەکرد، دڵتان(وە

---

[1] إبن أبي حاتم غ: (٢/٦١٦).

[2] مەبەست بە(الذئبَ على غنمه) ئەوەیە، کەس لە کەس ترسی نیە، لە چەرخی نەفامیدا کەس لە کەس ئەمین نەبووە.

[3] فتح الباري(٦/٧١٦).

[4] العنكبوت(١-٣).

[5] الاحزاب(١٠-١٢).

تەپە تەپ کەوت) گەیشتە قورقوڕاگەتان، زۆر خەیاڵی جۆراوجۆرتان لە بەرانبەر بە خودا بە دڵدا دەهات. لەو شوێنەدا تاقیکردنەوەی خاوەن باوەڕان دەستی پێکردو بە لەرزینێکی زۆر بە هێز دڵی هەمووان کەوتە لەرزە. لەو کاتەدا ئەو کەسانەی دووڕوو بوون ئەوانەشی کە دڵیان نەخۆش بوو، هەر دەیانوت: ئەو بەڵێنەی خوداو پێغەمبەر دەیاندا هەر بۆ فریوی ئێمە بوو. کاتێ هیرقل پرسی لە ئەبوسوفیان ئایا شەڕتان لەگەڵ کرد؟ دەڵێت: بەڵێ. دەڵێت: ئەو شەڕە چۆن بوو لە نێوانتاندا؟ بە نۆرە بوو، جارێ ئەوان سەردەکەوتن‌و جارێ ئێمە. دەڵێت: پێغەمبەران هەر وا بوون، تاقی دەکرانەوە، پاشان چارەنووس هەر بۆ ئەوان بوو[1]، واتە: (سەرکەوتن هەر بۆ ئەوان دەبوو) خودای مەزن ئەفەرموێت: ﴿مَّثَلُ ٱلَّذِينَ خَلَوۡاْ مِن قَبۡلِكُم﴾ ئەوەی بەسەر پێشینەکانتاندا هاتوە. وەك خودای مەزن لە ئایەتێکی ترا ئەفەرموێت: ﴿فَأَهۡلَكۡنَآ أَشَدَّ مِنۡهُم بَطۡشٗا وَمَضَىٰ مَثَلُ ٱلۡأَوَّلِينَ﴾[2] ئێمە زۆردارتر لەوانمان قڕکردوە. سەرگوزەشتەی پێشینەکان ڕابردووە. ئەفەرموێت: ﴿وَزُلۡزِلُواْ حَتَّىٰ يَقُولَ ٱلرَّسُولُ وَٱلَّذِينَ ءَامَنُواْ مَعَهُۥ مَتَىٰ نَصۡرُ ٱللَّهِ﴾ زۆر بە توندی تەکاندران، تەنانەت پێغەمبەرانیش‌و یارانی باوەڕداریش دەیان وت: کە کەی خودا بە هانامانەوە دێت؟ واتە: داوای تۆڵەیان لە دوژمنانیان دەکرد لە خوداو دەپاڕانەوە کە دەرویەکیان لێ بکاتەوە لەو تەنگانە زۆر ناڕەحەتە ڕزگاریان بکا. خودای مەزنیش ئەفەرموێت: ﴿أَلَآ إِنَّ نَصۡرَ ٱللَّهِ قَرِيبٞ﴾ تۆ بزانە کە یارمەتی خودا نزیکە. وەك لە ئایەتی تریشا ئەفەرموێت: ﴿فَإِنَّ مَعَ ٱلۡعُسۡرِ يُسۡرًا ۝٥ إِنَّ مَعَ ٱلۡعُسۡرِ يُسۡرٗا﴾[3] لەگەڵ تەنگانە خۆشی‌و فەرەح دێت. بێگومان لە پاش تەنگانە فەرمانی هەیە. واتە: چۆن تەنگانە دێت هەروایش سەرکەوتن دێت. هەر بۆیە خودای مەزن ئەفەرموێت: ﴿أَلَآ إِنَّ نَصۡرَ ٱللَّهِ قَرِيبٞ﴾ تۆ بزانە کە یارمەتی خودا نزیکە.

﴿ يَسۡـَٔلُونَكَ مَاذَا يُنفِقُونَۖ قُلۡ مَآ أَنفَقۡتُم مِّنۡ خَيۡرٖ فَلِلۡوَٰلِدَيۡنِ وَٱلۡأَقۡرَبِينَ وَٱلۡيَتَٰمَىٰ وَٱلۡمَسَٰكِينِ وَٱبۡنِ ٱلسَّبِيلِۗ وَمَا تَفۡعَلُواْ مِنۡ خَيۡرٖ فَإِنَّ ٱللَّهَ بِهِۦ عَلِيمٞ ۝٢١٥ ﴾

### کێ ماڵی پێ دەبەخشرێ

﴿ يَسۡـَٔلُونَكَ مَاذَا يُنفِقُونَۖ قُلۡ مَآ أَنفَقۡتُم مِّنۡ خَيۡرٖ فَلِلۡوَٰلِدَيۡنِ وَٱلۡأَقۡرَبِينَ وَٱلۡيَتَٰمَىٰ وَٱلۡمَسَٰكِينِ وَٱبۡنِ ٱلسَّبِيلِ ﴾ لێت دەپرسن: چی ببەخشن؟ پێیان بڵێ: هەرشتی چاك کە دەیبەخشن بیدەن بە دایك‌و باتنان‌و بە

---

[1] فتح الباري(٩/٢٥).

[2] الزخرف(٨).

[3] الشرح(٥-٦).

خزمانی نزیکتان‌و هەتیوان‌و هەژاران‌و ئەوانەی لە ڕێدا ماون(ڕێبواران)، لێت دەپرسن چۆن ببەخشن؟ ئیبنوعەبباس‌و موجاهید وتیان: خودای مەزن لەم ئایەتەدا بۆی ڕوون کردونەتەوە کە چۆن ببەخشن. موقاتیلی کوڕی حەیان دەڵێت: ئەم ئایەتە لەسەر بەخۆبەخشیی تەتەوع(التطوع) هاتوە[١]. واتە: سامانی خۆتان خەرج بکەن لەم ڕێگانەوە، وەك لەم فەرموودەدا هاتوە: (دایکت، باوکت، خوشکت، براکەت، پاشان لەوان دواترو دواتر)[٢]، مەیمونی کوڕی میهران ئەم ئایەتەی خوێندەوەو پاشان دەڵێت: ئەمە شوێنەکانی بەخشینە، خۆ باسی تەپڵ‌و زوڕناو وێنەو دارو تەختەو پەردەو دیوارەکانی نەکردوە[٣]، پاشان خودای مەزن ئەفەرموێت: ﴿وَمَا تَفْعَلُوا۟ مِنْ خَيْرٍ فَإِنَّ ٱللَّهَ بِهِۦ عَلِيمٌ﴾ هەر چاکەیێ ئێوە بیکەن، دیارە خودا پێی دەزانێ. خودا پاداشتتان ئەداتەوە لەسەری زۆر بە چاکی، چونکە خودا بە ئەندازەی گەردیلەیەك ناهەقی لە کەس ناکات.

﴿كُتِبَ عَلَيْكُمُ ٱلْقِتَالُ وَهُوَ كُرْهٌ لَّكُمْ ۖ وَعَسَىٰٓ أَن تَكْرَهُوا۟ شَيْـًٔا وَهُوَ خَيْرٌ لَّكُمْ ۖ وَعَسَىٰٓ أَن تُحِبُّوا۟ شَيْـًٔا وَهُوَ شَرٌّ لَّكُمْ ۗ وَٱللَّهُ يَعْلَمُ وَأَنتُمْ لَا تَعْلَمُونَ ﴿٢١٦﴾﴾

## جیهاد ئەرکێکە لەسەر موسوڵمانان

خودای مەزن ئەفەرموێت: ﴿كُتِبَ عَلَيْكُمُ ٱلْقِتَالُ﴾ غەزاتان لەسەر نوسراوە. خودای گەورە غەزای لەسەر موسوڵمانان فەرز کردوە بۆ ئەوەی شەڕی دوژمنان دوورخەنەوە لە ناوچەو هەرێمی ئیسلام. زوهری دەڵێت: جیهاد پێویستە لەسەر هەموو کەسێ لە غەزادا بێ یان دانیشتبێ لەسەر دانیشتوە کە داوای یارمەتی لێکردرا، یارمەتی بدات، کاتێ داوای هانای لێ کرا بچێت بە هاناوە. کە فەرمانی پێکرا دەرچێت بۆ غەزا بڕوات. ئەگەر پێویستیشی پێی نەبوو لە ماڵی خۆی بمێنێتەوە(منیش وتومە) هەر بۆیە لە فەرموودەی سەحیحا هاتوە: (هەرکەسێ بمرێت‌و جەنگی لە ڕێگەی خودا نەکردبێت‌و بەڵێشیدا نەهاتبێت کە بیکات، ئەوە بە مردنێکی نەفامی مردوە)[٤]، پێغەمبەری خودا(ﷺ) لە ڕۆژی فەتحی مەککەدا فەرموویەتی: (لەدوای فەتحەوە کۆچ کردن نیە، بەڵام جیهادو لێبڕان هەیە، هەرکات داواتان لێ کرا بچن بۆ جیهاد بڕۆن)[٥] خودای مەزن ئەفەرموێت: ﴿وَهُوَ كُرْهٌ لَّكُمْ﴾ هەرچەندە خۆشتان لێی نایە. واتە: زۆر بە لاتانەوە گران‌و سەختە. هەر وایشە، چونکە یان دەکوژرێ یا بریندار

---

[١] إبن أبي حاتم غ: (٢/٦١٩).

[٢] الحاكم(٣/٦١١)، فەرموودەیەکی باشە(جيد).

[٣] إبن أبي حاتم غ: (٢/٦٢٠).

[٤] مسلم(٣/١٥١٧).

[٥] فتح الباري(٤/٥٦).

دەبێ، لەگەڵ ناڕەحەتی سەفەر ڕووبەڕووبونەوەی دوژمنیش هەر گران‌و سەختە. پاشان خودای مەزن ئەفەرموێت: ﴿وَعَسَىٰٓ أَن تَكْرَهُوا۟ شَيْـًٔا وَهُوَ خَيْرٌ لَّكُمْ﴾ ڕەنگە لە شتێك حەز نەكەن بەڵام بۆتان بەخێر گەڕێ. واتە: دیارە شەڕ كردن سەركەوتن‌و زاڵ بوونی بەسەر دوژمندا بە دوادا دێت﴿وَعَسَىٰٓ أَن تُحِبُّوا۟ شَيْـًٔا وَهُوَ شَرٌّ لَّكُمْ﴾ ڕەنگە ئاوات بۆ شتێكیش بخوازن كە ئاكامەكەی باش نەبێ بۆتان. ئەمە هەموو شتێ دەگرێتەوە، جاری وا هەیە مرۆڤ حەزلەشتێ دەكات كە هیچ چاكەو بەرژەوەندیەكی تیا نیە. لەوانە، دانیشتن‌و خۆ لادان لە شەڕ دژی دوژمن، كە ئاكامەكەی ئەوەیە دوژمن دەست دەگرێت بەسەر وڵاتداو داگیری دەكا. پاشان خودای گەورە ئەفەرموێت: ﴿وَٱللَّهُ يَعْلَمُ وَأَنتُمْ لَا تَعْلَمُونَ﴾ خودا دەزانێ‌و ئێوە سەری لێ دەرناكەن. واتە: خودا باشتر ئاكامی شتەكان دەزانێ لە ئێوەو ئاگاداری كردوون لەو شتانەی كە چاكن بۆ ئێوە لە دنیاو لە ڕۆژی دوایاتندا، گوێڕایەڵی فەرمانی ئەو بن‌و سەرپێچی بڕیارەكانی مەكەن بەڵكو شارەزا بن.

﴿ يَسْـَٔلُونَكَ عَنِ ٱلشَّهْرِ ٱلْحَرَامِ قِتَالٍ فِيهِ ۖ قُلْ قِتَالٌ فِيهِ كَبِيرٌ ۖ وَصَدٌّ عَن سَبِيلِ ٱللَّهِ وَكُفْرٌۢ بِهِۦ وَٱلْمَسْجِدِ ٱلْحَرَامِ وَإِخْرَاجُ أَهْلِهِۦ مِنْهُ أَكْبَرُ عِندَ ٱللَّهِ ۚ وَٱلْفِتْنَةُ أَكْبَرُ مِنَ ٱلْقَتْلِ ۗ وَلَا يَزَالُونَ يُقَٰتِلُونَكُمْ حَتَّىٰ يَرُدُّوكُمْ عَن دِينِكُمْ إِنِ ٱسْتَطَٰعُوا۟ ۚ وَمَن يَرْتَدِدْ مِنكُمْ عَن دِينِهِۦ فَيَمُتْ وَهُوَ كَافِرٌ فَأُو۟لَٰٓئِكَ حَبِطَتْ أَعْمَٰلُهُمْ فِى ٱلدُّنْيَا وَٱلْـَٔاخِرَةِ ۖ وَأُو۟لَٰٓئِكَ أَصْحَٰبُ ٱلنَّارِ ۖ هُمْ فِيهَا خَٰلِدُونَ (٢١٧) إِنَّ ٱلَّذِينَ ءَامَنُوا۟ وَٱلَّذِينَ هَاجَرُوا۟ وَجَٰهَدُوا۟ فِى سَبِيلِ ٱللَّهِ أُو۟لَٰٓئِكَ يَرْجُونَ رَحْمَتَ ٱللَّهِ ۚ وَٱللَّهُ غَفُورٌ رَّحِيمٌ (٢١٨)﴾

**پۆل(سرية )ی نەخلەو حوكمی شەڕ كردن لە مانگی شەڕپەسا(الشهر الحرام )**

ئیبنوئەبی حاتەم ڕیوایەتی كردوە لە جوندەبی كوڕی عەبدوڵلاوە كە پێغەمبەری خودا(ﷺ) دەستەیەكی نارد، ئەبوعوبەیدەی كوڕی جەڕاحی كردە لێپرسراویان، كاتێ كە چوو بڕوات، سەبابە(صبابة) هاواری بردە لای پێغەمبەری خودا(ﷺ) ئەویش گلی دایەوە(نەیهێشت بڕوا) لە جێی ئەبوعوبەیدە، عەبدوڵلای كوڕی جەحشی ناردو كردیە لێپرسراویان، نامەیەكی بۆ نووسی، فەرمانی پێدا كە ئەو نامەیە نەخوێنێتەوە هەتا دەگاتەفلاّن شوێن فەرمووی: (هیچ كەسێ لە هاوەڵەكانت ناچار مەكە لە ڕێگەدا لەگەڵتا بڕوات) كاتێ كە نامەكەی خوێندەوە(إنا لله و إنا إليه راجعون)ی كردو دەڵێت: گوێڕایەڵ‌و بەرفەرمانی خوداو پێغەمبەرەكەیم، هەواڵەكەی پێدان‌و نامەكەی بۆ خوێندنەوە، دوو لەپیاوەكان گەڕانەوە و ئەوانی تر مانەوە، گەیشتن بە ئیبنوحەزرەمی و كوشتیان، نەیانزانی ئەو ڕۆژە لە مانگی ڕەجەبە یان لە مانگی جیمادە. بت پەرستەكان وتیان بە موسوڵمانەكان: لە مانگی

شەڕپەستا(الشهر الحرام) کوشتیان، خودای مەزن ئەم ئایەتەی ناردە خوارەوە: ﴿ يَسْـَٔلُونَكَ عَنِ ٱلشَّهْرِ ٱلْحَرَامِ قِتَالٍ فِيهِ قُلْ قِتَالٌ فِيهِ كَبِيرٌ ﴾[1] لێت دەپرسن: تووشی شەڕ بوون لە مانگی شەڕپەسا چۆنە؟ بڵێ: شەڕ لە مانگی وادا گوناهێکی زۆر گەورەیە. عەبدولمەلیکی کوڕی هیشام کە ئەم باسەی ڕیوایەت کردوە، دەڵێت: لە زیادی کوڕی عەبدوڵلای بەکائیەوە لە موحەممەدی کوڕی ئیسحاقی کوڕی یەساری مەدەنیەوە لە کتێبی سیرەتەکەیدا وتویەتی: پێغەمبەری خودا(ﷺ) عەبدوڵلای کوڕی جەحشی کوڕی ڕیئابی ئەسەدی لە مانگی ڕەجەبدا نارد کە لە سەفەری بەدری یەکەم گەڕابوەوە هەشت دەستەی لە کۆچەریەکانیشی لەگەڵا نارد، هیچ کەسێکی ئەنساریان لەگەڵا نەبوو نامەیەکی بۆ نووسیو فەرمانی پێدا سەیری نەکا هەتا دوو ڕۆژ بە ڕێگادا دەڕوات، پاشان سەیری بکاتو لەسەر ئەوە بڕوا کە فەرمانی پێکراوە. هیچ کەسێ لە هاوەڵەکانی ناچار نەکا لەگەڵی بڕۆن. هاوەڵەکانی عەبدوڵلای کوڕی جەحش لە کۆچەریەکان بوون. پاشان لە بەنی عەبدوشەمسی کوڕی مەناف: ئەبوحوزەیفەی کوڕی عوتبەی کوڕی ڕەبیعەی کورشی عەبدوشەمسی کوڕی عەبدومەناف بوو کە لە هاوپەیمانەکانی خۆیان بوو.عەبدوڵلای کوڕی جەحش کە بەرپرسیاری ئەو کۆمەڵە بوو، عەکاشەی کوڕی میحسەنیش یەکێك بوو لە بەنی ئەسەدی کوڕی خوزەیمە. لە بەنی نوفەلی کوڕی عەبدومەناف: عوتبەی کوڕی غەزوانی کوڕی جابیر بوو کە هاوپەیمانی خۆیان بوو. لە بەنی زوهرەی کوڕی کیلاب: سەعدی کوڕی ئەبی وەقاص، لە بەنی عەدی کوڕی کەعب: عامیری کوڕی ڕەبیعە کە هاوپەیمانیان بوو،لە عەتری کوڕی وائل: واقدی کوڕی عەبدوڵلای کوڕی عەبدومەنافی کوڕی عەرینی کوڕی سەعلەبەی کوڕی یەربوع، یەکێك بوو لە بەنی تەمیمیەکان کە هاوپەیمانیان بوو. خالیدی کوڕی بەکیر یەکێك بوو لە بەنی سەعدی کوڕی لەیس(لیث) کە هاوپەیمانیان بوو، لە بەنی حاریسی کوڕی فەهر: سوهەیلی کوڕی بەیزا بوو. کاتێ کە عەبدوڵلای کوڕی جەحش دوو ڕۆژ بە ڕێگەدا ڕۆشت، نامەکەی کردەوەو سەیری کرد ئەمەی تێدا نووسرا بوو: کاتێ کە سەیری ئەم نامەیەت کرد، بەردەوام بە لە ڕۆشتن هەتا دەچیتە نەخلە لە نێوان (مەککە و تائف)دایە. لەوێ چاودێری قورەیش بەو لە هەواڵیان ئاگادارمان بکە، کاتێ کە عەبدوڵلای کوڕی جەحش سەیری نامەکەی کرد، دەڵێت: گوێڕایەڵو بەرفەرمانم، پاشان بە هاوەڵەکانی وت: پێغەمبەری خودا(ﷺ) فەرمانی پێداوم کە بڕۆم هەتا دەگەمە نەخلە، لەوێ چاودێری قورەیش بکەم. هەتا هەواڵی قورەیشیان پێ بگەیەنم. ڕێی پێ نەداوم هیچ کەسێ لە ئێوە ناچار بکەم(لەگەڵم بێن) هەرکەسێ لە ئێوە ئارەزوی شەهیدی هەیەو حەزی لێدەکات با بێت، هەرکەسیش پێی ناخۆشە با بگەڕێتەوە، بەڵام من خۆم لەسەر فەرمانیپێغەمبەری خودا(ﷺ) دەچم. ڕۆشتو هاوەڵەکانیشی لەگەڵی ڕۆشتن هیچ

---

[1] إبن أبي حاتم غ: (٢/٦٢٨).

کەسێکیان دوا نەکەوت. ڕێگەی حیجازی گرتە بەر، هەتا کاتێ لە مەعدین بوون لەسەر فورعەوە کە پێی دەوترا بوحران(بُحران) سەعدی کوڕی ئەبی وەقاص‌و عوتبەی کوڕی غەزوان وشترێکیان لێ ون بووبوو بە شوێنیا دەگەڕان، جیا بوونەوە لە عەبدوڵلاو بە دوای وشترەکەدا دەگەڕان. عەبدوڵلای کوڕی جەحش‌و هاوەڵەکانی ڕۆشتن هەتا گەیشتنە نەخلە، کاروانێکی قورەیش بە لایاندا تێپەڕی، مێوژو خۆراکی بازرگانی قورەیشیان پێ بوو. عەمری کوڕی حەزرەمی‌و عوسمانی کوڕی عەبدوڵلای کوڕی موغەیرەو براکەی نەوفەلی کوڕی عەبدوڵلا کە هەردووکیان لە مەخزومیەکان بوون. حەکەمی کوڕی کەیسانیش لە مەولای هاشمی کوڕی موغەیرە بوو. کاتێ کە ئەوانە چاویان پێیان کەوت ترسان لێیان. بەڵام لە نزیکی ئەمان دابەزین. عەکاشەی کوڕی میحسەن بینینی، کاتێ کە چاویان پێی کەوت ترسیان نەماو وتیان: عەمارە هیچ ترسێکتان لێیان نەبێ. ئەمانیش دەستیان کردە ڕاوێژ کردن دەربارەیان. ئەو کاتەیش دواین ڕۆژی مانگی ڕەجەب بوو، وتیان: سوێند بە خوا ئەگەر ئەم شەو واز لەمانە بێنن خۆیان دەگەیەننە(حەرەم) ناتوانن هیچیان لەگەڵا بکەن، خۆ ئەگەر بشیان کوژن لە مانگی شەڕبەسا(الشهر الحرام) دەیانکوژن، کەوتنە دوودڵیەوەو دەترسان پەلاماریان بدەن، پاشان توانایان دا بە خۆیان، هاتنە سەر کوشتنی ئەوانەی کە دەتوانن بیانکوژن‌و ئەوەی پێیانە تالانی بکەن، واقیدی کوڕی عەبدوڵلای تەمیمی تیرێکی گرتە عەمری کوڕی حەزرەمی‌و کوشتی. عوسمانی کوڕی عەبدوڵلاو حەکەمی کوڕی کەیسانیش بە دیل گیران، نەوفەلی کوڕی عەبدوڵلایش لە دەستیان ڕایکردو نەیانتوانی بیگرن. عەبدوڵلای کوڕی جەحش‌و هاوەڵەکانی هاتنەوە بە کاروان‌و دوو دیلەکەوە هەتا گەیشتنەوە لای پێغەمبەری خودا(ﷺ) لە مەدینە. ئیبنوئیسحاق دەڵێت: هەندێ کەس لە کەسانی عەبدوڵلای کوڕی جەحش باسیان کردوە، کە عەبدوڵلا بە هاوەڵەکانی دەڵێت: لەو دەسکەوتەی بە دەستمان هێناوە پێنج یەکی بۆ پێغەمبەری خودایە(ﷺ). ئەمە لە پێش ئەوەدا بوو خودا پێنج یەك فەرز بکات لە تالانیدا. پێنجی جیا کردەوە لەو دەستکەوتە بۆ پێغەمبەری خودا(ﷺ)،ئەوەی مایەوە دابەشی کرد بەسەر هاوەڵەکانیدا. ئیبنوئیسحاق دەڵێت: کاتێ کە گەیشتنەوە لای پێغەمبەری خودا(ﷺ) فەرمووی: (من فەرمانم پێ نەکردن بە شەڕ کردن لە مانگی شەڕبەسا کاروان‌و دوو دیلەکەی ڕاوەستان، ڕازی نەبوو هیچ شتێکی لێ وەرگرێ. کاتێ کە پێغەمبەری خودا(ﷺ) ئەوەی فەرموو، ئەو خەڵکە دەستەوسان وەستان‌و وایان زانی ئیتر ئەوان تیاچوون، برا موسوڵمانەکانیشیان ئەو کارەیان لە لا گران بوو کە کردبویان، قورەیشیەکانیش وتیان: موحەممەدو(ﷺ) هاوەڵەکانی کوشتاریان لە مانگە حەرامەکاندا حەڵاڵ کردوەو خوێنیان تیدا ڕشتوەو ماڵ‌و سامانیان تیدا بە تالانی بردوەو پیاوانیشیان بەدیل گرتوە. هەر موسوڵمانێ بە لایاندا بچوایە لەوانە کە لە مەککە بوون پێیان دەوت: ئەوەی تووشیان هات، تووشیان هات لە شەعباندا نەبوو. جوولەکەیش دەیان وت: گەشبین بن بەوە لەسەر

پێغەمبەری خودا کە: عەمری کوڕی حەزرەمی واقیدی کوڕی عەبدوڵڵا کوشتویەتی. عەمر شەڕەکەی دروست کرد، حەزرەمی ئامادەی شەڕەکە بوو واقیدی کوڕی عەبدوڵڵاش شەڕەکەی هەڵگیرساند، خودا ئەوەی بەسەری خۆیاندا هێنا نەك ئەوان کاتێ کە خەڵکی زۆر بوون لەو بارەیەوە قسەیان دەکرد، خودای مەزن ئەم ئایەتەی ناردە خوارەوە بۆ پێغەمبەری خودا(ﷺ) فەرمووی: ﴿ يَسْـَٔلُونَكَ عَنِ ٱلشَّهْرِ ٱلْحَرَامِ قِتَالٍ فِيهِ ۖ قُلْ قِتَالٌ فِيهِ كَبِيرٌ ۖ وَصَدٌّ عَن سَبِيلِ ٱللَّهِ وَكُفْرٌۢ بِهِۦ وَٱلْمَسْجِدِ ٱلْحَرَامِ وَإِخْرَاجُ أَهْلِهِۦ مِنْهُ أَكْبَرُ عِندَ ٱللَّهِ ۚ وَٱلْفِتْنَةُ أَكْبَرُ مِنَ ٱلْقَتْلِ ﴾ لێت دەپرسن: تووشی شەڕ بوون لە مانگی شەڕپەسا چۆنە؟ بڵێ: شەڕ لە مانگی وادا گوناهێکی زۆر گەورەیەو ڕێگەی بەرەو خوا بەستنو حاشا لە خودا کردنو ماڵی خوا بەڕێز نەگرتنە. لێ وەدەرنانی خەڵکەکەی(لە لای خودا) تاوانی هەرە مەزنە، ئاژاوەیش بۆ شەڕ نانەوە لە کوشتن خراپترە. واتە: ئەگەر ئێوە شەڕتان کرد لە مانگی شەڕپەسا، خۆ ئەوان بوونە ڕێگرتان لە ڕێی خواداو بڕواشیان هەر بە خوداو(مەسجدلحەرامیش) نەبوو، دەرکردنی ئێوەش کە خەڵکی ئەوێ بوون(أكبر عند الله) لە لای خودا گەورەتر بوو لەوەی ئێوە کوشتتان ﴿وَٱلْفِتْنَةُ أَكْبَرُ مِنَ ٱلْقَتْلِ﴾ ئاژاوە بۆ شەڕ نانەوە لە کوشتن خراپترە. واتە: ئەو خوانەناسانە ئازاری موسوڵمانەکانیان ئەدا بۆ ئەوەی لە ئاینەکەیان پاشگەز ببنەوە، دوای باوەڕ هێنان بچنەوە سەر خوانەناسی. ئەوە زۆر لە کوشتن خراپترە. ﴿وَلَا يَزَالُونَ يُقَـٰتِلُونَكُمْ حَتَّىٰ يَرُدُّوكُمْ عَن دِينِكُمْ إِنِ ٱسْتَطَـٰعُوا۟﴾ ئەوان دەستان لێ بەرنادەن، هەر لەگەڵ ئێوە شەڕ دەکەن(هەتا ئەگەر بۆیان بکرێ) ئێوە لە ئاینەکەی خۆتان وەربگێڕن. واتە: ئەوانە لەسەر ئەو پیسیەی خۆیان هەر دەمێننو پاشگەز نابنەوەو وازی لێ ناهێنن. پاشان خودای گەورە ئەفەرموێت: ﴿وَمَن يَرْتَدِدْ مِنكُمْ عَن دِينِهِۦ فَيَمُتْ وَهُوَ كَافِرٌ فَأُو۟لَـٰٓئِكَ حَبِطَتْ أَعْمَـٰلُهُمْ فِى ٱلدُّنْيَا وَٱلْـَٔاخِرَةِ ۖ وَأُو۟لَـٰٓئِكَ أَصْحَـٰبُ ٱلنَّارِ ۖ هُمْ فِيهَا خَـٰلِدُونَ ﴾ هەر کەسیش لە دین وەرگەڕێو بە خوانەناسی بمرێ، ڕەنج خەساری دنیاشو قیامەتیش دەبنو دەکەونە ناو جەهەنەمەوە تا هەتا هەر تیا دەبن. ئیبنوئیسحاق دەڵێت: کاتێ کە قورئان هاتە خوارەوە دەربارەی ئەم باسەو خودا دەرووی لە موسوڵمانان کردەوەو لەو سەختیو ناڕەحەتیە ڕزگاریان بوو، پێغەمبەری خودا(ﷺ) کاروانەکەو دیلەکانیشی وەرگرت، قورەیشیەکان ناردیان بۆ لای کە فیدیەیان لێ وەرگرێ لە باتی عوسمانی کوڕی عەبدوڵڵاو حەکەمی کوڕی کەیسانەوە ئازادیان بکا. پێغەمبەری خودا(ﷺ) فەرمووی: (فیدیەتان لێ وەرناگرین هەتا دوو هاوەڵەکەمان دێنەوە. واتە: (سەعدی کوڕی ئەبی وەقاصو عوتبەی کوڕی غەزوان) ئەگەر ئەوان کوشتبنیان ئێمەش دوو هاوەڵەکەی ئێوە دەکوژین) سەعدو عوتبە هاتنەوە، پێغەمبەری خودا(ﷺ) فیدیەی لێ وەرگرتن. حەکەمی کوڕی کەیسان موسوڵمان بوو،

موسوڵمانێکی چاکیشن، لە لای پێغەمبەری خودا(ﷺ) مایەوە. بەڵام عوسمانی کوڕی عەبدوڵڵا ڕۆشتەوە بۆ مەککەو لەوێ بە خوانەناسی مرد. ئیبنوئیسحاق دەڵێت: کاتێ عەبدوڵڵای کوڕی جەحشو هاوەڵەکانی بۆیان دەرکەوت دوای ئەو حاڵە سەختەی تێدا بوون، کاتێ کە قورئان هاتە خوارەوە بە هیوای پاداشت بوون، وتیان: ئەی پێغەمبەری خودا(ﷺ) ئایا بە هیوای ئەوە بین بە غەزایە بۆمان بنووسرێو پاداشتی موجاهیدینی تیا وەرگرین؟ خودای مەزن ئەم ئایەتەی ناردە خوارەوە: ﴿ إِنَّ ٱلَّذِينَ ءَامَنُواْ وَٱلَّذِينَ هَاجَرُواْ وَجَٰهَدُواْ فِي سَبِيلِ ٱللَّهِ أُوْلَٰٓئِكَ يَرْجُونَ رَحْمَتَ ٱللَّهِۚ وَٱللَّهُ غَفُورٞ رَّحِيمٞ ﴾ ئەوانەی لە ڕێی خودا دەربەدەرنو باوەڕیان بە خودا هەیە، لە ڕێی خودا چوونە غەزا، بە ئومێدن بۆیان حیساب بکا، خودا لەوانە دەبورێو دلۆڤانە. خودا لەسەر ئەو کارەیان نائومێدی نەکردن[1].

﴿ يَسْـَٔلُونَكَ عَنِ ٱلْخَمْرِ وَٱلْمَيْسِرِۖ قُلْ فِيهِمَآ إِثْمٞ كَبِيرٞ وَمَنَٰفِعُ لِلنَّاسِ وَإِثْمُهُمَآ أَكْبَرُ مِن نَّفْعِهِمَاۗ وَيَسْـَٔلُونَكَ مَاذَا يُنفِقُونَ قُلِ ٱلْعَفْوَۗ كَذَٰلِكَ يُبَيِّنُ ٱللَّهُ لَكُمُ ٱلْأٓيَٰتِ لَعَلَّكُمْ تَتَفَكَّرُونَ ﴿٢١٩﴾ فِي ٱلدُّنْيَا وَٱلْأٓخِرَةِۗ وَيَسْـَٔلُونَكَ عَنِ ٱلْيَتَٰمَىٰۖ قُلْ إِصْلَاحٞ لَّهُمْ خَيْرٞۖ وَإِن تُخَالِطُوهُمْ فَإِخْوَٰنُكُمْۚ وَٱللَّهُ يَعْلَمُ ٱلْمُفْسِدَ مِنَ ٱلْمُصْلِحِۚ وَلَوْ شَآءَ ٱللَّهُ لَأَعْنَتَكُمْۚ إِنَّ ٱللَّهَ عَزِيزٌ حَكِيمٞ ﴿٢٢٠﴾ ﴾

**حەرامکردنی( مەیی ) پلە پلە**

ئیمامی ئەحمەد ڕیوایەتی کردوە لە ئەبو مەیسەرەوە(میسرة) لە عومەرەوە کە دەڵێت: کاتێ ئایەتی حەرام کردنی مەیی(ئارەق) هاتە خوارەوە، دەڵێت: ئەی خودایە دەربارەی مەیخواردنەوە بە تەواوی بۆمان ڕوونو ئاشکرا کە. ئەم ئایەتەی سورەتی(البقرە) هاتە خوارەوە کە ئەفەرموێت: ﴿ يَسْـَٔلُونَكَ عَنِ ٱلْخَمْرِ وَٱلْمَيْسِرِۖ قُلْ فِيهِمَآ إِثْمٞ كَبِيرٞ ﴾ لەسەر مەییو قوماریش لێت دەپرسن، بڵێ: تاوانیان گەورەیە. عومەر بانگ کراو بە سەریدا خوێنرایەوەو دەڵێت: ئەی خودایە دەربارەی مەی بە تەواوی بۆمان ڕوونو ئاشکرا کە. ئەم ئایەتەی سورەتی(ا لنساء) هاتە خوارەوە: ﴿ يَٰٓأَيُّهَا ٱلَّذِينَ ءَامَنُواْ لَا تَقْرَبُواْ ٱلصَّلَوٰةَ وَأَنتُمْ سُكَٰرَىٰ ﴾[2] ئەی کۆمەڵی خاوەن باوەڕان، بە سەرخۆشی لە نوێژ نزیک مەبنەوە. جاڕدەری پێغەمبەری خودا(ﷺ) کە وەختی نوێژ هات جاڕی دا: سەرخۆش نزیکی نوێژ نەکەوێتەوە عومەر بانگ کراو بۆی خوێنرایەوەو دەڵێت: ئەی خودایە دەربارەی مەی بە تەواوی بۆمان ڕوونو ئاشکرا کە. ئەو دوو ئایەتەی سورەتی(المائدە) هاتنە خوارەوە، عومەر بانگ کرا بۆی

---

[1] إبن هشام(٢/٢٥٢–٢٥٥).

[2] النساء(٤٣).

خوێنرایەوە کە گەیشتە ﴿فَهَلۡ أَنتُم مُّنتَهُونَ﴾[1] ئایا ئێوە دەس لەو کارانە هەڵدەگرن؟ عومەر دەڵێت: دەستمان هەڵگرت، دەستمان هەڵگرت[2] هەر وا ئەبوداودو تیرمیزیو نەسائی ڕیوایەتیان کردوە[3] عەلی کوڕی مەدینی دەڵێت: ئەم سەنەدە چاکو سەحیحە، تیرمیزیش بەسەحیحی داناوە، بەو زوانە ئەم فەرموودەیە دیسان لەگەڵ ئەو فەرموودانەی ئیمامی ئەحمەد ڕیوایەتی کردوون لە ڕێگەی ئەبوهورەیرەوە دێتەوەلەم ئایەتەی سورەتی مائیدەدا کە خودای مەزن ئەفەرموێت: ﴿إِنَّمَا ٱلۡخَمۡرُ وَٱلۡمَيۡسِرُ وَٱلۡأَنصَابُ وَٱلۡأَزۡلَٰمُ رِجۡسٞ مِّنۡ عَمَلِ ٱلشَّيۡطَٰنِ فَٱجۡتَنِبُوهُ لَعَلَّكُمۡ تُفۡلِحُونَ﴾[4] ئەی ئەوانەی بڕواتان هێناوە،مەیخۆریو قومار کردنو کێل پەرستیو گرەو لەسەر تیر کردن، لە کارەکانی شەیتانن، خۆتانی لێ بپارێزن، هەتا ڕزگار بن. خودای گەورە ئەفەرموێت: ﴿يَسۡـَٔلُونَكَ عَنِ ٱلۡخَمۡرِ وَٱلۡمَيۡسِرِ﴾ پرسیارت لێ دەکەن دەربارەی مەی و قومار. دەربارەی مەی وەك گەورە موسوڵمانان عومەری کوڕی خەتاب(ڕەزای خوای لێ بێ) دەڵێت: هەر شتێ ئاوەز نەهێڵێو تێکی بدا، وەك بەو زوانە لە سورەتی مائیدەدا باسی دێت، (میسر)یش قومارە[5] پاشان ئەفەرموێت: ﴿قُلۡ فِيهِمَآ إِثۡمٞ كَبِيرٞ وَمَنَٰفِعُ لِلنَّاسِ﴾ بڵێ: تاوانیان گەورەیەو بۆ خەڵکیش بەهرەیان هەیەو، تاوانەکە لە بەهرەکەیان زۆرترە. خۆ دیارە خراپو تاوانەکەیان بۆ دینەن سوودەکانیشی دنیایی یە، سوودی هەیە بۆ هەرس کردن فرێدانی کەڵك وەرگرتن لە نرخەکەی بۆ فرۆشتنو گێڕانی لەگەڵ خۆ بۆ بەکارهێنانی لە ڕێگەوبانداو. بەڵام ئەم بەرژەوەندیانە هەر جێی باس نیە بەرانبەر زیانەکانیو بەدفەرییەکانیو خراپەکانی کەئێجگار زۆرترن،، هەر بۆیە خودای مەزن ئەفەرموێت: ﴿وَإِثۡمُهُمَآ أَكۡبَرُ مِن نَّفۡعِهِمَا﴾ تاوانەکەیان لە بەهرەکەیان زۆرترە. جا ئەم ئایەتە هەڕەشەیە بۆقەدەغە کردنی. هەرچەندە بە ڕوونی حەرامی نەکردوە بەڵام ئاماژەی بۆ کردوە، عومەری کوڕی خەتابیش(ڕەزای خوای لێ بێ) کاتێ کە بۆی خوێنرایەوە دەیگوت ئەی خودایە دەربارەی مەی بە تەواوی بۆمان ڕوونو ئاشکرا کە. هەتا ئایەت لە سورەتی(المائدە)دا هاتە خوارەوە حەرامی کرد وەك خودای مەزن ئەفەرموێت: ﴿يَٰٓأَيُّهَا ٱلَّذِينَ ءَامَنُوٓاْ إِنَّمَا ٱلۡخَمۡرُ وَٱلۡمَيۡسِرُ وَٱلۡأَنصَابُ وَٱلۡأَزۡلَٰمُ رِجۡسٞ مِّنۡ عَمَلِ ٱلشَّيۡطَٰنِ فَٱجۡتَنِبُوهُ لَعَلَّكُمۡ تُفۡلِحُونَ ۝٩٠ إِنَّمَا يُرِيدُ ٱلشَّيۡطَٰنُ أَن يُوقِعَ بَيۡنَكُمُ ٱلۡعَدَٰوَةَ وَٱلۡبَغۡضَآءَ فِي ٱلۡخَمۡرِ وَٱلۡمَيۡسِرِ وَيَصُدَّكُمۡ عَن

---

[1] المائدة(٩١).

[2] أحمد(١/٥٣١)، فەرموودەیەکی مورسەلە.

[3] أبوداود(٤/٧٩)، تحفة الاحوذي(٨/٤١٥)، النسائي(٨/٢٨٧)، مورسەلە.

[4] المائدة(٩٠).

[5] أحمد(٢/٣٥١).

ذِكْرِ اللَّهِ وَعَنِ الصَّلَوٰةِ فَهَلْ أَنتُم مُّنتَهُونَ﴾[1]، ئه‌ی كۆمه‌ڵی خاوه‌ن باوه‌ڕان مه‌ی خۆری‌و قومار كردن‌و كێل په‌رستی‌و گره‌و له‌سه‌ر تیر كردن له كاره‌كانی شه‌یتانن، خۆتانی لێ بپارێزن هه‌تا تووشی ڕزگاری بن. شه‌یتان مه‌به‌ستی ئه‌مه‌یه به‌مه‌ی خواردن‌و قومار ئاژاوه‌تان بخاته ناو له نوێژو یادی خودا لاتان دا، ئایا ئێوه ده‌س له‌و كارانه به‌ر ئه‌ده‌ن. به ویستی خودا به‌و زوانه قسه له‌م باسه ده‌كه‌ین له سووره‌تی(المائده)دا. ئیبنوعومه‌رو شه‌عبی‌و موجاهیدو قه‌تاده‌و ڕه‌بیعی كوڕی ئه‌نه‌س‌و عه‌بدوڕه‌حمانی كوڕی زه‌یدی كوڕی ئه‌سله‌م وتیان: ئه‌م ئایه‌ته هاته خواره‌وه له‌سه‌ر عه‌ره‌ق ﴿يَسْأَلُونَكَ عَنِ الْخَمْرِ وَالْمَيْسِرِ قُلْ فِيهِمَا إِثْمٌ كَبِيرٌ﴾ ده‌رباره‌ی مه‌ی و قومار لێت ده‌پرسن، بڵێ: تاوانیان گه‌وره‌یه. پاشان ئه‌و ئایه‌ته‌ی سوره‌تی(النساء) هاته خواره‌وه. دوای ئه‌ویش ئه‌و ئایه‌تانه‌ی سوره‌تی( المائده) هاتنه خواره‌وه‌و عه‌ره‌قیان حه‌رام كرد[2].

### فه‌رماندان به به‌خشینی ماڵ زیاده له پێویست

﴿وَيَسْأَلُونَكَ مَاذَا يُنفِقُونَ قُلِ الْعَفْوَ﴾ وه لێت ده‌پرسن، چی له ڕێی خوادا به‌خت كه‌ن؟ بڵێ: زیاده له پێویستتان ﴿الْعَفْوَ﴾(به مه‌نسوبی‌و به مه‌رفوعیش خوێنراوه‌ته‌وه.) هه‌ردووكیان چاكه‌و جێی خۆیه‌تی. حه‌كه‌م ده‌ڵێت له میقسه‌مه‌وه له ئیبنوعه‌بباسه‌وه ﴿وَيَسْأَلُونَكَ مَاذَا يُنفِقُونَ قُلِ الْعَفْوَ﴾ ده‌ڵێت: ئه‌وه‌ی له پێویستی ماڵ‌و منداڵت زیاده[3]. هه‌ر وایش ڕیوایه‌ت كراوه له ئیبنوعومه‌رو موجاهیدو عه‌تاو عیكرمه‌و سه‌عیدی كوڕی جوبه‌یرو موحه‌ممه‌دی كوڕی كه‌عب‌و حه‌سه‌ن‌و قه‌تاده‌و قاسم‌و سالم‌و عه‌تای خۆراسانی‌و ڕه‌بیعی كوڕی ئه‌نه‌س‌و كه‌سانی تریشه‌وه.[4] ئیبنوجه‌ریر ڕیوایه‌تی كردوه له ئه‌بوهوره‌یره‌وه، ده‌ڵێت: پیاوێ ده‌ڵێت: ئه‌ی پێغه‌مبه‌ری خودا دینارێكم هه‌یه. فه‌رمووی: (له خۆتدا خه‌رجی بكه) ده‌ڵێت دینارێكی ترم هه‌یه، فه‌رمووی: (خه‌رجی بكه بۆ خێزانه‌كه‌ت) ده‌ڵێت: هی ترم هه‌یه، فه‌رمووی: (خه‌رجی بكه بۆ كوڕه‌كه‌ت) ده‌ڵێت: هی ترم هه‌یه، فه‌رمووی: (خۆت باشتر ده‌زانی)[5] واته: به كێی بده‌ی باشه (موسلیم ڕیوایه‌تی كردوه له سه‌حیحه‌كه‌یدا. دیسان موسلیم ڕیوایه‌تی كردوه له جابیره‌وه كه پێغه‌مبه‌ری خودا(ﷺ) فه‌رموویه‌تی: (له خۆته‌وه ده‌س پێ بكه(پێی ببه‌خشه)، بێگومان زیاده‌ی مشت بۆ خێزانته، زیاده‌ی شت له خێزانت بۆ خزمه‌كانته، بێگومان زیاده له كه‌س‌و

---

[1] المائدة(٩٠-٩١). إبن أبي حاتم غ: (٢/٦٣٦).
[2] الطبري(٤/٣٣١-٣٣٦).
[3] إبن أبي حاتم غ: (٢/٦٥٦).
[4] إبن أبي حاتم غ: (٢/٦٥٦-٦٥٧).
[5] الطبري(٤/٣٤٠).

کارت شتێکە ئاواو ئاوایە)[1] وە لە فەرموودەدا دیسان هاتوە: (ئەوەی ئادەم تۆ ئەگەر زیادەی سامانت ببەخشی چاکە بۆت، وە ئەگەر بیشیگریتەوە خراپە بۆت، لۆمە ناکرێی لەسەر ئەوە پێی بژی)[2] پاشان خودای مەزن ئەفەرموێت: ﴿كَذَٰلِكَ يُبَيِّنُ ٱللَّهُ لَكُمُ ٱلْءَايَٰتِ لَعَلَّكُمْ تَتَفَكَّرُونَ ﴿٢١٩﴾ فِى ٱلدُّنْيَا وَٱلْءَاخِرَةِ﴾ ئا بەو جۆرە خودا نیشانەکانی خۆیتان نیشان ئەدا، بەڵکو ئێوە بتوانن بیر بکەنەوە. هەم لە دنیاو هەم لە قیامەتیش واتە: وەك چۆن ئەم خزمانانەتان بۆ جیا دەکاتەوەو ڕوونو ئاشکرای دەکات بۆتان، هەر بەو جۆرەیش نیشانەکانی تریشتان بۆ ڕوون دەکاتەوە لە بڕیارو بەڵێنو هەڕەشەکانیشیدا تا بیر بکەنەوە لە کاری هەردوو دنیاتان. عەلی کوڕی ئەبوتەلحە لە ئیبنوعەبباسەوە دەڵێت واتە: بیر بکەنەوە لە نەمانی دنیاو لەناوچوونیو ڕووەو قیامەت چوونو بەردەوامی ڕۆژی قیامەت[3].

### چاکسازی لە سامانی هەتیواندا

﴿وَيَسْـَٔلُونَكَ عَنِ ٱلْيَتَٰمَىٰ ۖ قُلْ إِصْلَاحٌ لَّهُمْ خَيْرٌ ۖ وَإِن تُخَالِطُوهُمْ فَإِخْوَٰنُكُمْ ۚ وَٱللَّهُ يَعْلَمُ ٱلْمُفْسِدَ مِنَ ٱلْمُصْلِحِ ۚ وَلَوْ شَآءَ ٱللَّهُ لَأَعْنَتَكُمْ﴾ لێت دەپرسن دەربارەی هەتیوان چۆن بین؟ بڵێ: ئەگەر بە دڵسۆزی ئاگاتان لێیان بێ کاری چاکە. ئەگەر لەگەڵ ئێوە دەژین، وەك براو خوشکی خۆتان بن، خودا دەزانێ کێ بەدفەڕەو کێ کار چاکە، ئەگەر خودا بیویستایە ئەرکی لێ گران دەکردن، ئیبنوجەریر ڕیوایەتی کردوە لە ئیبنوعەبباسەوە، دەڵێت: کاتێ ئەم ئایەتانە هاتنە خوارەوە: ﴿وَلَا تَقْرَبُوا۟ مَالَ ٱلْيَتِيمِ إِلَّا بِٱلَّتِى هِىَ أَحْسَنُ﴾[4] مەچنە نزیکی ماڵو سامانی هەتیوان مەگین بە چەشنێ کە باشتر(بپارێزی). ﴿إِنَّ ٱلَّذِينَ يَأْكُلُونَ أَمْوَٰلَ ٱلْيَتَٰمَىٰ ظُلْمًا إِنَّمَا يَأْكُلُونَ فِى بُطُونِهِمْ نَارًا ۖ وَسَيَصْلَوْنَ سَعِيرًا﴾[5] ئەو کەسانەی بە ناڕەوا دارایی هەتیوان دوخۆن، با بزانن کە ئاگرێ دەخەنە ناو هەناویانەوە، تووشی ئاگرێکی بە هەڵپەو بڵێسەدەبن. ئەو کەسانەی کە هەتیویان لە لابوو هەڵسان خواردنو خواردنەوەی خۆیان جیا کردەوە لە خواردنو خواردنەوەیئەوان. بۆیان هەڵدەگرتن هەتا دەیانخوارد یان خراپ دەبوو. ئەو کارە زۆر گران بوو لەسەریانو ئەوەیان لە لای پێغەمبەری خودا(ﷺ) باسکرد خودای مەزن ئەم ئایەتەی ناردە خوارەوە: ﴿وَيَسْـَٔلُونَكَ عَنِ ٱلْيَتَٰمَىٰ ۖ قُلْ إِصْلَاحٌ لَّهُمْ خَيْرٌ ۖ وَإِن تُخَالِطُوهُمْ فَإِخْوَٰنُكُمْ﴾ لێت دەپرسن دەربارەی

---

[1] مسلم(٢/٦٩٢).

[2] مسلم(١٠٣٦).

[3] الطبري(٤/٣٤٨).

[4] الانعام(١٥٢).

[5] النساء(١٠).

هەتیوان چۆن بن؟ بڵێ: ئەگەر بە دڵسۆزی ئاگاتان لێیان بێ کاری چاکە، ئەگەر لەگەڵ ئێوە دەژین، وەك براو خوشكی خۆتان بن، پاشان خواردنو خواردنەوەی خۆیان تێکەڵ بە خواردنو خواردنەوەی هەتیوان کردەوە[1] هەروا ئەبوداوودو نەسائی ڕیوایەتیان کردوە[2]، حاکمیش لە موستەدرەکەکەیدا هێناویەتی[3] زۆرێکیش ڕیوایەتیان کردوە لە هۆی هاتنە خوارەوەی ئایەتەکەدا وەك موجاهیدو عەتاو شەعبی کوڕی ئیبنوئەبی لەیلاو قەتادەو کەسانی تریش لە زانایانی پێشینەو پاشینە[4] وەکیعی کوڕی جەڕاح ڕیوایەتی کردوە لە عائیشەوە(ڕەزای خوای لێ بێ) دەڵێت: من پێم ناخۆشە ماڵی هەتیوانم لە لا بێو خراپ ببێ، هەتا وای لێ دێ خواردنو خواردنەوەی خۆم تێکەڵی خواردنو خواردنەوەی ئەوان بکەم[5] پاشان خودای مەزن ئەفەرموێت: ﴿قُلۡ إِصۡلَاحٞ لَّهُمۡ خَيۡرٞۖ وَإِن تُخَالِطُوهُمۡ فَإِخۡوَٰنُكُمۡ﴾ بڵێ: چاکسازی(تێکەڵاوی کردن) بۆ ئەوان چاکترە. ئەگەر تێکەڵ بن لەگەڵیاندا(خراپ نیە) براتانن. واتە: ئەگەر خواردنو خواردنەوەی خۆتان تێکەڵ بە خواردنو خواردنەوەی ئەوان کرد گوناهتان ناگا. چونکە ئەوانە برای ئاینی ئێوەن. ﴿وَٱللَّهُ يَعۡلَمُ ٱلۡمُفۡسِدَ مِنَ ٱلۡمُصۡلِحِ﴾ خودا دەزانێ کێ بەدفەڕەو کێ کار چاکە. پاشان خودای مەزن ئەفەرموێت: ﴿وَلَوۡ شَآءَ ٱللَّهُ لَأَعۡنَتَكُمۡۚ إِنَّ ٱللَّهَ عَزِيزٌ حَكِيمٞ﴾ ئەگەر خودا بیویستایە ئەرکی لێ گران دەکردن، خودا خاوەن دەستەڵاتی لە کارزانە. بەڵام خودا دەرووی لێ کردنەوەو لەسەری سووك کردنو ڕێی پێدان کە تێکەڵیان بن بە شێوەیەکی چاك. وەك ئەفەرموێت: ﴿وَلَا تَقۡرَبُواْ مَالَ ٱلۡيَتِيمِ إِلَّا بِٱلَّتِي هِيَ أَحۡسَنُ﴾[6] مەچنە نزیك ماڵو سامانی هەتیوان مەگین بە چەشنێ کە باشتر(بپارێزرێ)، بەڵام ڕێگە دراوە بە هەژار کە لێی بخوات بە شێوەیەکی چاك، یان بە مەرجێ ئەگەر خودا دەروی لێکردەوە بۆیان قەرەبوو بکاتەوە یان قەرەبووشی نەکاتەوە، وەك بەو زوانە لە سورەتی(النساء) باسی دێت دا بە ویستی خودای مەزن.

---

[1] الطبري(٤/٣٥٠).

[2] أبوداود(٣/٢٩١)، النسائي(٦/٢٥٦)، حاکمو زەهەبی بە سەحیحیان داناوە.

[3] الحاکم(٢/١٠٣).

[4] الطبري(٤/٣٥٠-٣٥٣).

[5] الطبري(٤/٣٥٥).

[6] الانعام(١٥٢).

﴿وَلَا تَنكِحُوا۟ ٱلْمُشْرِكَٰتِ حَتَّىٰ يُؤْمِنَّ ۚ وَلَأَمَةٌ مُّؤْمِنَةٌ خَيْرٌ مِّن مُّشْرِكَةٍ وَلَوْ أَعْجَبَتْكُمْ ۗ وَلَا تُنكِحُوا۟ ٱلْمُشْرِكِينَ حَتَّىٰ يُؤْمِنُوا۟ ۚ وَلَعَبْدٌ مُّؤْمِنٌ خَيْرٌ مِّن مُّشْرِكٍ وَلَوْ أَعْجَبَكُمْ ۗ أُو۟لَٰٓئِكَ يَدْعُونَ إِلَى ٱلنَّارِ ۖ وَٱللَّهُ يَدْعُوٓا۟ إِلَى ٱلْجَنَّةِ وَٱلْمَغْفِرَةِ بِإِذْنِهِۦ ۖ وَيُبَيِّنُ ءَايَٰتِهِۦ لِلنَّاسِ لَعَلَّهُمْ يَتَذَكَّرُونَ (٢٢١)﴾

## قەدەغە كردنی هاوسەرگیری لەگەڵ ژنان و پیاوانی بت پەرستان

﴿وَلَا تَنكِحُوا۟ ٱلْمُشْرِكَٰتِ حَتَّىٰ يُؤْمِنَّ﴾ ژنانی بت پەرست مارە مەكەن هەتا باوەڕ دەهێنن. خودای مەزن هاوسەرگیری قەدەغە كردوە لە خاوەن باوەڕان لەگەڵ ئەو ژنانەی كە بت پەرستن. دیارە ئەگەر مەبەست گشت بێ دینێك بوایە، باسی گشت ژنە بت پەرستێكی دەكرد لە ئەهلی كتێبو بت پەرستەكان. بۆیە ژنانی ئەهلی كتێبی تایبەت كردوەو ئەفەرموێت: ﴿وَٱلْمُحْصَنَٰتُ مِنَ ٱلَّذِينَ أُوتُوا۟ ٱلْكِتَٰبَ مِن قَبْلِكُمْ إِذَآ ءَاتَيْتُمُوهُنَّ أُجُورَهُنَّ مُحْصِنِينَ غَيْرَ مُسَٰفِحِينَ﴾[1] ئەو ژنە داوێن پاكانەشی كە پێش لە ئێوە كتێبیان پێدراوە، بەو مەرجە كە مارەییەكانیان بدەنێ، خۆشتان دەبێ داوێن پاك بن نە داوێن پیس. عەلی كوڕی ئەبوتەلحە دەڵێت لە ئیبنوعەبباسەوە لەم دەقەدا كە خودای گەورە ئەفەرموێت: ﴿وَلَا تَنكِحُوا۟ ٱلْمُشْرِكَٰتِ حَتَّىٰ يُؤْمِنَّ﴾ ژنانی بت پەرست مارە مەكەن هەتا باوەڕ دەهێنن. خودای مەزن لەوەدا ژنانی ئەهلی كتێبی جیا كردۆتەوە[2] موجاهیدو عیكرمەو سەعیدی كوڕی جوبەیرو مەكحولو حەسەنو زەححاكو زەیدی كوڕی ئەسلەمو ڕەبیعی كوڕی ئەنەسو كەسانی تریش هەروایان وتوە[3] وتراوە: بەڵكو مەبەست بەوە ئەو موشریكانەن كە بت پەرستن، بە هیچ شێوەیەك باسی ئەهلی كتێبی تێدا نەهاتوە. ئەم مانایە لە یەكەمەوە نزیكە(والله أعلم.) ئیبنوجەریر داوای باس كردنی كۆ دەنگی زانایانی كردوە لەسەر ڕێ پێدانی هاوسەرگیری لەگەڵ ژنانی ئەهلی كتێب، تەنیا عومەر ئەوەی پێ ناخۆشە،لەبەر ئەوە نەكا خەڵكی واز لە ژنانی موسوڵمان بێنن یان لەبەر هەر مانایەكی تر[4] وەك ئەبوكورەیب ڕیوایەتی كردوە لە شەقیقەوە، دەڵێت: حوزەیفە ژنێكی جوولەكەی مارە كرد، عومەر نامەیەكی بۆ نووسی پێی وت: وازی لێ بێنێ. ئەمیش نامەیەكی بۆ نووسی دەڵێت: ئایا وا دەزانی حەرامە هەتا وازی لێ بێنم؟ دەڵێت: وا نازانم ئەوە حەرامە، بەڵام من دەترسم ژنە خراپەكانیان بكەنە

---

[1] المائدة(٥).

[2] الطبري(٤/٣٦٢).

[3] إبن أبي حاتم غ: (٢/٦٦٩-٦٧١).

[4] الطبري(٤/٣٦٦).

هاوسەر[1] ئەم سەنەدە سەحیحە. ئیبنوجەریر ڕیوایەتی کردوە لە زەیدی کوڕی وەهەبەوە دەڵێت: عومەری کوڕی خەتاب دەڵێت: موسوڵمان ژنی مەسیحی مارە دەکا. بەڵام مەسیحی ژنی موسوڵمان مارە ناکات[2]. ئیبنوئەبی حاتەم ڕیوایەتی کردوە لە ئیبنو عومەرەوە، کە هاوسەرگیری ژنی ئەهلی کتێبی پێ ناخۆش بووە. ﴿وَلَا تَنكِحُوا۟ ٱلْمُشْرِكَـٰتِ حَتَّىٰ يُؤْمِنَّ﴾ ژنانی بت پەرست مارە مەکەن هەتا باوەڕ دەهێنن. تەئویل کردووە[3]. بوخاری دەڵێت: ئیبنوعومەر دەڵێت: من نازانم هیچ شیرکێ لەوە گەورەتر بێ کە ژنێ بڵێ: پەروەردگاری ئەو عیسایە[4]. لەهەردووسەحیحەکەدا هاتووە لەئەبوهورەیرەوە لە پێغەمبەرەوە(ﷺ) فەرموویەتی: (لەبەر چوار مەبەست ئافرەت دەخوازرێ: یان بۆ ماڵو سامانەکەی، یان لەبەر بنەماڵەکەی، یان لەبەر جوانیەکەی یان لەبەر دینداریەکەی جا تۆ ئافرەتی دیندار بهێنە تا دەست پڕ بەرەکەت بێت)[5] موسلیمش لە جابیرەوە هەر وا ڕیوایەتی کردوە[6] هەر لەوە لە ئیبنوعومەرەوە کە پێغەمبەری خودا(ﷺ) فەرموویەتی: (ئەم دونیا خۆشیە، چاکترین خۆشی دنیاش ئافرەتێکی چاکە)[7] خودای مەزن ئەفەرموێت: ﴿وَلَأَمَةٌ مُّؤْمِنَةٌ خَيْرٌ مِّن مُّشْرِكَةٍ وَلَوْ أَعْجَبَتْكُمْ﴾ کەنیزەکێکی بڕوادار باشترە لە ژنە(ئازادێکی) بت پەرست با(ژنە بت پەرستەکە) سەرسامیشی کردبن. هەروەها ئەفەرموێت: ﴿وَلَا تُنكِحُوا۟ ٱلْمُشْرِكِينَ حَتَّىٰ يُؤْمِنُوا۟﴾ ژنانی موسوڵمانیش مارە مەکەن لە بت پەرستان هەتا باوەڕ نەهێنن. وەك خودای گەورە لە ئایەتێکی ترا ئەفەرموێت: ﴿لَا هُنَّ حِلٌّ لَّهُمْ وَلَا هُمْ يَحِلُّونَ لَهُنَّ﴾[8] نە ئەمان بۆ ئەوان دەشێنو نە ئەوانیش بۆ ئەمان دەشێن،(واتە: بۆ یەك حەڵاڵ نین) ﴿وَلَعَبْدٌ مُّؤْمِنٌ خَيْرٌ مِّن مُّشْرِكٍ وَلَوْ أَعْجَبَكُمْ﴾ کۆیلەیەکی بڕوادار باشترە لە(ئازادێکی بت پەرست با سەرسامیشی کردبن) خاوەن دەستەڵاتیش بێ. چونکە پیاوی موسوڵمان زۆر چاکترە(با عەبدێکی حەبەشیش بێ) لە بت پەرست. ﴿أُو۟لَـٰٓئِكَ يَدْعُونَ إِلَى ٱلنَّارِ﴾ ئەوان دەیانەوێ ئێوە بەرەو ئاگر ڕاکێشن واتە: ژیان لەگەڵ ئەوانەو تێکەڵاوی کردنیان بەرەو خۆشەویستی دنیا دەتانباتو ڕێزی دنیا ئەدەن بەسەر ڕۆژی دوایداو

---

[1] الطبري(٤/٣٦٦).

[2] الطبري(٤/٣٦٦).

[3] إبن أبي حاتم غ: (٢/٦٧١).

[4] فتح الباري(٩/٣٢٦).

[5] فتح الباري(٩/٣٥)، مسلم(٢/١٠٨٧).

[6] مسلم(٢/١٠٨٧).

[7] مسلم(٢/١٠٩٠).

[8] الممتحنة(١٠).

پاشه ڕۆژ ئەوەیش زۆر خراپە. ﴿وَٱللَّهُ يَدْعُوٓاْ إِلَى ٱلْجَنَّةِ وَٱلْمَغْفِرَةِ بِإِذْنِهِۦ﴾ خودایش دەیەوێ بە ئیزنی خۆی لە گوناهتان ببورێو بتانگەێنێتە بەهەشت. بە پەیامەکەیو بەوەی فەرمانی پێداونو بەوەیش لێی قەدەغە کردون. ﴿وَيُبَيِّنُ ءَايَٰتِهِۦ لِلنَّاسِ لَعَلَّهُمْ يَتَذَكَّرُونَ﴾ خودا ئەم نیشانانەی خۆی بۆ مەردم ڕوون دەکاتەوە بەڵکو بیر بکەنەوە.

﴿ وَيَسْـَٔلُونَكَ عَنِ ٱلْمَحِيضِ قُلْ هُوَ أَذًى فَٱعْتَزِلُواْ ٱلنِّسَآءَ فِى ٱلْمَحِيضِ وَلَا تَقْرَبُوهُنَّ حَتَّىٰ يَطْهُرْنَ فَإِذَا تَطَهَّرْنَ فَأْتُوهُنَّ مِنْ حَيْثُ أَمَرَكُمُ ٱللَّهُ إِنَّ ٱللَّهَ يُحِبُّ ٱلتَّوَّٰبِينَ وَيُحِبُّ ٱلْمُتَطَهِّرِينَ (٢٢٢) نِسَآؤُكُمْ حَرْثٌ لَّكُمْ فَأْتُواْ حَرْثَكُمْ أَنَّىٰ شِئْتُمْ وَقَدِّمُواْ لِأَنفُسِكُمْ وَٱتَّقُواْ ٱللَّهَ وَٱعْلَمُوٓاْ أَنَّكُم مُّلَٰقُوهُ وَبَشِّرِ ٱلْمُؤْمِنِينَ (٢٢٣) ﴾

**فەرماندان بە سەرجێیی نەکردن لە کاتی عوزری ژنانەدا**

﴿ وَيَسْـَٔلُونَكَ عَنِ ٱلْمَحِيضِ قُلْ هُوَ أَذًى ﴾ لە بارەی بێ نوێژیەوە لێت دەپرسن، بڵێ: ئەوە ئازارێکە. ئیمامی ئەحمەد ڕیوایەتی کردوە لە ئەنەسەوە کە جوولەکە ئەگەر ئافرەتانیان بکەوتایەتە بێنوێژی، نانیان لەگەڵ نەدەخواردنو، لە ماڵدا لەگەڵیان دانەدەنیشتن هاوەڵان لە پێغەمبەریان(ﷺ) پرسی لەو بارەیەوە، ئەم ئایەتە هاتە خوارەوە ﴿وَيَسْـَٔلُونَكَ عَنِ ٱلْمَحِيضِ قُلْ هُوَ أَذًى فَٱعْتَزِلُواْ ٱلنِّسَآءَ فِى ٱلْمَحِيضِ وَلَا تَقْرَبُوهُنَّ حَتَّىٰ يَطْهُرْنَ﴾ لەبارەی بێ نوێژی ژنانەوە لێت دەپرسن، بڵێ: ئەویش ئازارێکە. ئەو چەند ڕۆژەی حوێنیان هەیە سەرجێیی ژنانتان مەکەن. هەتا کۆتایی ئایەتەکە. پێغەمبەری خودا(ﷺ) فەرمووی: (هەموو شتێکی لەگەڵدا بکەن جگە لە سەرجێیی) ئەو هەواڵە بە جوولەکەکان گەیشت وتیان: ئەم پیاوە دەیەوێ هەرچی کاری ئێمە هەیە پێچەوانەکەی بکات. ئوسەیدی کوڕی خوزەیر و عیبادی کوڕی بیشر هاتنو وتیان: ئەی پێغەمبەری خودا جوولەکەکان ئاواو ئاوا دەڵێن: ئایا سەرجێییان لەگەڵدا نەکەین؟ ڕەنگی پێغەمبەری خودا(ﷺ) ئەوەندە گۆڕا هەتا وا گومانمان برد کە پێغەمبەر(ﷺ) لێیان تورە بووبێت، ڕۆشتنەدەرەوە، لەقاپێ شیر بەشیدانو خواردیانەوە، بەوەدا زانیان کە پێغەمبەر(ﷺ) توورە نیە لێیان[1]. خودای مەزن ئەفەرموێت: ﴿فَٱعْتَزِلُواْ ٱلنِّسَآءَ فِى ٱلْمَحِيضِ﴾ ئەو چەند ڕۆژەی خوێنیان هەیە سەرجێیی ژنانتان مەکەن. واتە دواین وەك پێغەمبەر(ﷺ) فەرموویەتی: (هەموو شتێکی لەگەڵدا بکەن جگە لە سەرجێیی)[2] هەر لەبەر ئەوەیە زۆرینەی زانایان دەڵێن دروستە یاری کردن لەگەڵ ژندا لە کاتی بێنوێژیدا جگە سەرجێی کردن لەگەڵی.

---

[1] أحمد(٣/١٣٢)، فەرموودەیەکی سەحیحە.

[2] مسلم(١/٢٤٦).

ئەبوداوود ڕیوایەتی کردوە لە عیکرمەو لە هەندێ لە خێزانەکانی پێغەمبەرەوە(ﷺ) کە پێغەمبەری خودا(ﷺ) کاتێ شتێکی لە خێزانێکی حەیزداری بویستایە پۆشاکێکی ئەدا بەسەر شەرمیا[1]، ئەبوجەعفەری کوڕی جەریر ڕیوایەتی کردوە لە مەسروق کەوتە ڕێ(بە سواری ولاغ) بۆ لای عائیشە و دەڵێت: سەلامی خوا لە پێغەمبەرو خێزانەکانی. عائیشە دەڵێت: باوکی عائیشەیە، بەخێر بێ بەخێر بێ(مرحباً مرحباً) ئیزنیان پێداو هاتە ژوورەوەو دەڵێت: من دەمەوێ پرسیارێکت لە شتێك لێ بکەم، من شەرمیش دەکەم،عائیشە دەڵێت: بێگومان من دایکی تۆمو تۆش کوڕی منی، چی بۆ پیاو دروستە لە ژنەکەیدا کە لە حەیزدا بێ؟ عائیشە دەڵێت: هەموو شتێکی بۆ هەیە جگە لە شەرمی(إلا فرجها)[2] ئەمە قسەی ئیبنوعەبباس‌و موجاهیدو حەسەن‌و عیکرمەشە. منیش دەڵێم: لەگەڵ خەوتن‌و خواردن‌و خواردنەوە حەلاڵە بەبێ ناکۆکی لە نێوان زانایاندا، عائیشە دەڵێت: پێغەمبەری خودا(ﷺ) فەرمانی پێکردم کە سەری بشۆرم من لە حەیزدا بووم. سەری دەکردە سەر کۆشم‌و منیش لە حەیزدا بووم، قورئانی دەخوێند.[3] هەر لە فەرموودەی سەحیحدا هاتووە لە عائیشەوە دەڵێت: من قەپم دەگرت لە پلە گۆشت‌و من لە حەیزدا بووم، ئینجا ئەمدایە دەستی پێغەمبەر(ﷺ) ئەویش دەمی دەخستە شوێنی دەمەکەی من(و دەڵێی خواردەو). لە خواردنەوەشداپاش خۆم دەخوارد ئەمدایە دەستی ئەو، ئەویش دەمی دەخستە شوێنی دەمەکەی من کە لێیەوە لێم دەخواردەوە[4] وە لە هەردوو سەحیحەکەدا هاتوە لە مەیمونەی کچی حارسی هیلالیەوە، دەڵێت: پێغەمبەری خودا(ﷺ) بیویستایە یاری لەگەڵ ژنێ لە خێزانەکانی بکات کە لە حەیزدا بوایە فەرمانی پێدەکرد نێوان ناوك و ئەژنۆی بە باشی داپۆشێت. ئەمە وتەی بوخاریە[5] لە هەردوو سەحیحەکەدا هاتووە لە عائیشەوە بەو جۆرە.[6] ئیمامی ئەحمەدو ئەبوداوودو تیرمیزی‌و ئیبنوماجە ڕیوایەتیان کردوە لە عەبدوڵلای کوڕی سعدی ئەنساریەوە کە پرسیاری لە پێغەمبەری خودا کرد(ﷺ) چیم بۆ حەلاڵە لە ژنەکەم کە لە حەیز دایە؟ فەرمووی: (ئەوەی لەسەر پۆشاکەوەیە)[7]، واتە: شەرمی داپۆشرابێ(ئەوی تری حەلاڵە). خودای مەزن ئەفەرموێت: ﴿وَلَا تَقۡرَبُوهُنَّ حَتَّىٰ يَطۡهُرۡنَ﴾ ڕاوەستن تا پاك دەبنەوە، تەفسیری ئەم دەقەیە کە

---

[1] أبوداود(١/٢٨٦)، فەرموودەیەکی مورسەلە.

[2] الطبري(٤/٣٧٨).

[3] فتح الباري(١/٤٧٩).

[4] مسلم(١/٢٤٥).

[5] فتح الباري(١/٤٨٣)، مسلم(١/٢٤٣).

[6] فتح الباري(١/٤٨٠)، مسلم(١/٢٤٢).

[7] أحمد(٤/٣٤٢)، أبوداود(١/١٤٥)، تحفة الاحوذي(١/٤١٥)، إبن ماجة(١/٢١٣)، سەنەدەکانی حەسەنە.

ئەفەرموێت: ﴿فَٱعۡتَزِلُواْ ٱلنِّسَآءَ فِي ٱلۡمَحِيضِ﴾ دووركەونەوە لە هاوسەرەكانتان لە كاتی حەیزدا. نزیك بوونەوە لێیان بە مەبەستی سەرجێیی كردن قەدەغە كراوە هەتا لە حەیزدا بن، دەیارە كە پاك بوونەوەو خوێنەكە نەما دروستە. ئەفەرموێت: ﴿فَإِذَا تَطَهَّرۡنَ فَأۡتُوهُنَّ مِنۡ حَيۡثُ أَمَرَكُمُ ٱللَّهُ﴾ هەركاتیَ لە خوێن پاك بوونەوە، لەو جێیەوە كە خوا فەرمانی پێداون بۆیان بڕۆن. ئەم دەقە ڕێنمایی‌و پێ نیشاندانی تێدایە بۆ ڕۆشتن بۆ لایان دوای خۆ شوردن. زانایان كۆ دەنگن كاتیَ كە ئافرەت خوێنی حەیزی نەماو بڕا. دروست نیە سەرجێیی لەگەڵ كردنیان هەتا خۆیان نەشۆرن بە ئاو یان ئەگەر نەیان توانی خۆیان بشۆرن دەبیَ تەیەموم بكەن بەو مەرجانەی تەیەموم هەیەتی. ئیبنوعەبباس دەڵێت: ﴿حَتَّىٰ يَطۡهُرۡنَ﴾ هەتا پاك دەبنەوە لە خوێن ﴿فَإِذَا تَطَهَّرۡنَ﴾ كاتیَ بە ئاو خۆیان شۆرد. موجاهیدو عیكرمەو حەسەن‌و موقاتیلی كوڕی حەیان‌و لەیسی كوڕی سەعدو كەسانی تریش هەر وایان وتوە[1].

**قەدەغە كردنی سەرجێیی لە غەیرمز شەرمەوە( فی الدبر )**

﴿مِنۡ حَيۡثُ أَمَرَكُمُ ٱللَّهُ﴾ لەو جێیەوە كە خوا فەرمانی پێداون. ئیبنوعەبباس‌و موجاهیدو كەسانی تریش وتویانە: مەبەست پێی شەرمە(الفرج)[2] ئەم دەقە بەڵگەیە لەسەرنە چوونە لای هاوسەر لە دواوە(الدبر)( وەك بەو زوانە باسی لیَ دەكریَ بە ویستی خودای مەزن.) ئەبوزەڕین‌و عیكرمەو زەحاك‌و كەسانی تریش دەڵێن: ﴿فَأۡتُوهُنَّ مِنۡ حَيۡثُ أَمَرَكُمُ ٱللَّهُ﴾ لەو جێیەوە كە خوا فەرمانی پێداون بۆیان بڕۆن. واتە: كاتیَ كە پاك بوونەوەو حەیزەكەیان نەما[3] هەر بۆیە ئەفەرموێت: ﴿إِنَّ ٱللَّهَ يُحِبُّ ٱلتَّوَّٰبِينَ﴾ خودا ئەو كەسانەی خۆش دەویَ كە لە گوناه پەشیمانن. با چەندین جار گوناهیشیان كردبیَ ﴿وَيُحِبُّ ٱلۡمُتَطَهِّرِينَ﴾ ئەوانەشی خۆش دەوێن كە بە پاكی‌و خاوێنی بژین‌و خۆیان دوور دەگرن لە كاری پیس‌و بە ئازار كە قەدەغەیان لیَ كراوە وەك سەرجێیی كردنی هاوسەر لە حەیز دا یان لە غەیرەز شوێنی خۆیەوە كە خودا فەرمانی پێداون.

---

[1] إبن أبي حاتم غ: (٢/٦٨٢-٦٨٣).

[2] إبن أبي حاتم غ: (٢/٦٨٤).

[3] إبن أبي حاتم غ: (٢/٦٨٤-٦٨٥).

## هۆی هاتنه خوارەوەی ئایەتی ﴿نِسَآؤُكُمْ حَرْثٌ لَّكُمْ﴾

﴿نِسَآؤُكُمْ حَرْثٌ لَّكُمْ﴾ ژنانتان كێڵگەی خۆتانن. ئیبنوعەبباس دەڵێت:(الحرث) شوێنی منداڵ[1]. ﴿فَأْتُوا۟ حَرْثَكُمْ أَنَّىٰ شِئْتُمْ﴾ بچنە كێڵگەی خۆتانەوە لە هەر كوێوە دەتانەوێ. واتە: چۆنتان حەز لێیە، لە پێشەوە،لە پاشەوە، لە یەك دەمەوانەوە(شوێنەوە) وەك چەندین فەرموودە هاتوە لەو بارەیەوە. بوخاری ڕیوایەتی كردوە لە ئیبنومنكەدەر دەڵێت: لە جابیرم بیستم دەڵێت: جوولەكەكان دەیان وت: ئەگەر چوونە لای ئافرەت لە پاشەوە بێت ئەو منداڵە خێل دەردەچێت، ئەم ئایەتە هاتە خوارەوە: ﴿نِسَآؤُكُمْ حَرْثٌ لَّكُمْ فَأْتُوا۟ حَرْثَكُمْ أَنَّىٰ شِئْتُمْ﴾ ژنانتان كێڵگەی خۆتانن، بچنە كێڵگەی خۆتانەوە لە هەر كوێوە دەتانەوێ.[2] موسلیمو ئەبوداوودیش ڕیوایەتیان كردوە[3] ئیبنوئەبی حاتەم ڕیوایەتی كردوە: لە موحەممەدی كوڕی منكەدەر كە جابیری كوڕی عەبدوڵلاوە هەواڵی پێدرا جوولەكە وتویانە بە موسوڵمانان: هەركەسێ چووە لای ئافرەتێ لە پاشەوە ئەو منداڵە خێل دەردەچێت، خودای مەزن ئەم ئایەتەی نارده خوارەوە: ﴿نِسَآؤُكُمْ حَرْثٌ لَّكُمْ فَأْتُوا۟ حَرْثَكُمْ أَنَّىٰ شِئْتُمْ﴾ ژنانتان كێڵگەی خۆتانن. لە هەر كوێوە دەتانەوێ بچنە كێڵگەی خۆتانەوە. ئیبنوجورەیج لەم فەرموودەیەدا دەڵێت: پێغەمبەری خودا(ﷺ) فەرموویەتی: (لە پێشەوە لە پاشەوە ئەگەر ئەوە لە شەرمەوە بوو(الفرج))[4]، ئیمامی ئەحمەد ڕیوایەتی كردوە لە ئیبنوعەبباسەوە، دەڵێت: ئەم ئایەتە كە خودای مەزن ئەفەرموێت: ﴿نِسَآؤُكُمْ حَرْثٌ لَّكُمْ﴾ ژنانتان كێڵگەی خۆتانن، هاتە خوارەوە لەبارەی چەند كەسێكی ئەنساریەوە كە هاتنە لای پێغەمبەری خودا(ﷺ) پرسیاریان لێكرد، پێغەمبەر(ﷺ) فەرمووی: (بە هەموو شێوەیەك بچنە لایان، ئەگەر ئەو سەرجێیی یە لە شەرمەوە بێ(الفرج))[5]، واتە: دروستە. دیسان ئیمامی ئەحمەد ڕیوایەتی كردوە لە عەبدوڕەحمانی كوڕی سابتەوە دەڵێت: چوومە لای حەفسەی كچی عەبدوڕەحمانی كوڕی ئەبوبەكر وتم: من دەربارەی كارێ لێت دەپرسم، بەڵام شەرم دەكەم لە بارەیەوە لێت پرسم، دەڵێت: حەفسە دەڵێت: ئەی برازای خۆم شەرم مەكە، دەڵێت: لێت دەپرسم لە بارەی سەرجێیی كردنی ژنان لە پاشەوە؟ حەفسە دەڵێت: ئوموسەلەمە بۆی باس كردم كە ئەنساریەكان لە پاشەوە

---

[1] الطبري(٤/٣٩٧).

[2] فتح الباري(٨/٣٧٠).

[3] مسلم(٢/١٠٥٨)، أبوداود(٢/٦١٨).

[4] إبن أبي حاتم غ: (٢/٦٨٤-٦٨٥).

[5] أحمد(١/٢٦٨)، فەرموودەیەكی لاوازە بەڵگەی تر پشتگیری لێ دەكات.

نەدەچوونە لای ژنەکانیان،جوولەکەکان دەیا وت: هەرکەسێ لە پاشەوە بچێتە لای ژنەکەی منداڵەکەی خێل دەردەچێ. کاتێ کۆچەریەکان هاتنە مەدینە ئافرەتانی ئەنساریان مارە کرد، ویستیان لە پاشەوە بچنە لایان. ژنێك ڕازی نەبوو. گوێڕایەڵی هاوسەرەکەی بێ و دەڵێت: شتی وا ناکا هەتا نەچێتە لای پێغەمبەر(ﷺ) ڕۆشتە لای ئوموسەلەمەو ئەوەی بۆ باس کرد، ئوموسەلەمە پێی وت: دانیشە هەتا پێغەمبەری خودا(ﷺ) دێت، کاتێ کە پێغەمبەر(ﷺ) هات، ئافرەتە ئەنساریەکە شەرمی کرد پرسیار لە پێغەمبەری خودا بکات(ﷺ) چووە دەرەوە ئوموسەلەمە باسەکەی بۆ پێغەمبەری خودا گێڕایەوە(ﷺ) فەرمووی: (ئەو ژنە ئەنساریە بانگ بکە، بانگ کراو ئەم ئایەتەی بۆ خوێندەوە: ﴿نِسَآؤُكُمۡ حَرۡثٌ لَّكُمۡ فَأۡتُواْ حَرۡثَكُمۡ أَنَّىٰ شِئۡتُمۡ﴾ ژنانتان کێڵگەی خۆتانن لە هەر کوێوە دەتانەوێ بچنە کێڵگەی خۆتانەوە.(لە یەك دەمەوانەوە) واتە: تەنیا لە شەرمەوە(الفرج))[1]، تیرمیزیش ڕیوایەتی کردوە دەڵێت فەرموودەیەکی حەسەنە.[2] نەسائی ڕیوایەتی کردوە لە کەعبی کوڕی عەلقەمەوە لە ئەبونەزرەوە مەوالی پێداوە کە وتویەتی بە نافیع مەولای ئیبنوعومەر کە خەڵکی زۆر باست دەکەن، کە تۆ وتوتە ئیبنوعومەر فەتوای داوە کە بچنە لای ئافرەتان لە پاشەوە. دەڵێت: درۆیان بە دەم منەوە هەڵبەستوە.، بەڵام من ئەوەت بۆ باس دەکەم چۆن بووە، ئیبنوعومەر ڕۆژێك قورئانێکی سەیر دەکرد منیش لە لای بووم، کاتێ گەیشتە: ﴿نِسَآؤُكُمۡ حَرۡثٌ لَّكُمۡ فَأۡتُواْ حَرۡثَكُمۡ أَنَّىٰ شِئۡتُمۡ﴾ ژنەکانتان کێڵگەی خۆتانن، لە هەر کوێوە دەتانەوێ بچنە کێڵگەی خۆتان. پاشان دەڵێت: ئەی نافیع ئایا دەزانی ئەم ئایەتە فەرمان بە چی دەکا؟ وتم: نەخێر، دەڵێت: ئێمەی قورەیشی لە پاشەوە دەچووینە لای ژنان. کاتێ کە چووینە مەدینەو ژنانی ئەنساریمان مارە کرد، ویستمان هەر بەو شێوەیە کە کردومانە لەگەڵ ئەوانیشی بکەین، ئەو ئافرەتانە ئەوەیان پێ ناخۆش بوو، بە لایانەوە زۆر گران بوو، چونکە ژنانی ئەنساری، جوولەکەکان چیان دەکرد، ئەوانیش هەر وایان دەکرد،جوولەکەکان لە پاشەوە نەدەچوونە لای ژنەکانیان، خودای مەزن ئەم ئایەتەی ناردە خوارەوە: ﴿نِسَآؤُكُمۡ حَرۡثٌ لَّكُمۡ فَأۡتُواْ حَرۡثَكُمۡ أَنَّىٰ شِئۡتُمۡ﴾ ژنانتان کێڵگەی خۆتانن، لە هەر کوێوە دەتانەوێ بچنە کێڵگەی خۆتان.[3] سەنەدەکەی سەحیحە. ئیمامی ئەحمەد ڕیوایەتی کردوە لە خوزەیمەی کوڕی سابتەوە کە پێغەمبەری خودا(ﷺ) فەرموویەتی: (خودا لە هەق شەرم ناکا(سێ جار). مەچنە لای ژنان لە دوایانەوە(کۆمیانەوە))[4]،

---

[1] أحمد(٦/٣٠٥)، فەرموودەیەکی حەسەنە.

[2] تحفة الاحوذي(٨/٣٢٢)، حەسەنە.

[3] النسائي في الكبرى(٥/٣١٥).

[4] أحمد(٥/٢١٥).

نەسائیو ئیبنوماجەیش ڕیوایەتیان کردووە[1] تیرمیزیو نەسائی ڕیوایەتیان کردوە لە ئیبنوعەبباسەوە، دەڵێت: پێغەمبەری خودا(ﷺ) فەرموویەتی: (خودا سەیری پیاوێ ناکا کە چووبێتە لای پیاوێ یان ژنێ لە کۆمیەوە)[2] پاشان تیرمیزی دەڵێت: ئەم فەرموودە، فەرموودەیەکی حەسەنی غەریبە، ئیبنوحەبانیش لە سەحیحەکەیدا هێناویەتی، ئیبنوحەزمیش بە سەحیحی داناوە. ئیمامی ئەحمەد ڕیوایەتی کردوە لە عەلی کوڕی تەلقەوە(طلق) دەڵێت: پێغەمبەری خودا(ﷺ) قەدەغەی کردوە لە کۆمەوە چوونە لای ژنان، بێگومان خودا لەسەر هەق شەرم ناکا.[3] تیرمیزی ڕیوایەتی کردوەو دەڵێت: ئەم فەرموودە حەسەنە[4] ئەبوموحەممەد کوڕی عەبدوڵلای کوڕی عەبدوڕەحمانی دارەمی لە موسنەدەکەیدا لە سەعیدی کوڕی یەساری ئەبوحوبابەوە، دەڵێت: وتم: بە ئیبنوعومەر: تۆ چی دەڵێیت دەربارەی ئەو کەنیزانەی کاتێ(أُنَحَمِّضُ لهنَّ)؟ دەڵێت: وما التحميض؟ باسی کۆمی کرد(الدبر) ئیبنوعومەر دەڵێت: ئایا هیچ کەسێ لە موسوڵمانان شتی وا دەکات[5]؟ ئەم فەرموودە سەنەدەکەی سەحیحەو دەقێکە لە ئەوەوە کە ئەو کارەی حەرام کردوە. ئەبوبەکری کوڕی زیادی نیسابوری دەڵێت: ئیسماعیلی کوڕی(حصن) بۆی گێڕامەوە. ئیسماعیلی کوڕی(روح) بۆی گێڕامەوە. پرسیارم کرد لە کالیکی کوڕی ئەنەس: چی دەڵێیت لە چوونە لای ئافرەت لە کۆمیانەوە(أدبارهن)؟ دەڵێت: ئێوە گەلێکی عەرەبن، ئایا کێڵان دەبێ جگە لە شوێنی چاندن؟ لە شەرم(الفرج) لا مەدەن. وتم: ئەی ئەبوعەبدوڵلا، ئەوان دەڵێن تۆ ئەوەت وتوە. دەڵێت: درۆ بە دەممەوە هەڵدەبەسن. درۆ بە دەممەوە هەڵدەبەسن، بێگومان ئەمە قسەی ئەوە. ئەمە قسەی سەعیدی کوڕی موسەییبو ئەبوسەلەمەو عیکرمەو تاوسو عەتاو سەعیدی کوڕی جوبەیرو عوروەی کوڕی زوبەیرو موجاهیدی کوڕی جەبرو حەسەنو کەسانی تریشە لە زانایانی پێشینە(السلف) کە زۆر ناڕەزاییان دەربڕیوە لەسەر ئەو کارە. لای هەندێ لە زانایان هەر کەسێ ئەو کارە بکات خوانەناسە(کافرە)، ئەوە ڕێبازی کۆی(جمهور) زانایانە. پاشان خودای مەزن ئەفەرموێت: ﴿وَقَدِّمُوا۟ لِأَنفُسِكُمْ﴾ توێشویەکیش پێش خۆتان بخەن. واتە: لە خوا پەرستی کردنو پەرێز کردن لەو شتانەی کە خودا قەدەغەی کردوون لەو شتە حەرامانە. هەر بۆیە خودای گەورە ئەفەرموێت: ﴿وَاتَّقُوا۟ اللَّهَ وَاعْلَمُوٓا۟ أَنَّكُم مُّلَٰقُوهُ﴾ دەبێ لە خوا بترسن. بشزانن

---

[1] النسائي في الكبرى(٥/٣١٦)، إبن ماجة(١/٦١٩)، حەسەنە.

[2] تحفة الاحوذي(٤/٣٥٩)، النسائي في الكبرى(٥/٣٢٠)، إبن حبان(٦/٢٠٢)، حەسەنە.

[3] ذكره إبن حجر في أطراف المسند(٤/٣٨٤) و لم يوجد في المطبوع، حەسەنە.

[4] تحفة الاحوذي(٤/٢٧٤)، حەسەنە.

[5] الدارمي(١/٢٧٧) ح(١١٤٣).

لەگەڵ خودا ڕووبەڕوو دەبنەوە. لێپرسینەوەتان لەگەڵدا دەكات لەسەر هەموو ئاكارێكتان ﴿وَبَشِّرِ ٱلْمُؤْمِنِينَ﴾ مژدەیش بدە بەوانەی خاوەن باوەڕن. واتە: ئەوانەی بەرفەرمانی خودان لەو شتانەی فەرمانیان پێدەكاو واز لەو شتانەش دێنن كە هەڕەشەی لێكردوون، ئیبنوجەریر ڕیوایەتی كردوە لە عەتاوە دەڵێت: ئیبنوعەبباس دەڵێت: ﴿وَقَدِّمُواْ لِأَنفُسِكُمْ﴾ دەڵێت: (بسم الله) ناوی خودا دەهێنیٚ لە كاتی سەرجێیی كردنا(الجماع)[1] لە سەحیحی بوخاریدا هاتوە لە ئیبنوعەبباسەوە، دەڵێت: پێغەمبەری خودا(ﷺ) فەرموویەتی: (هەر یەك لە ئێوە ئەگەر ویستی بچێتە لای خێزانی بڵێت: ئەی خودایە شەیتانمان لیٚ دوور بخەرەوە، شەیتانیش دوورخەرەوە لەوەی پێمان دەبەخشی، ئەگەر لەوەدا منداڵیان بوو شەیتان هەرگیز زیانی پیٚ ناگەیەنێت)[2].

﴿وَلَا تَجْعَلُواْ ٱللَّهَ عُرْضَةً لِّأَيْمَٰنِكُمْ أَن تَبَرُّواْ وَتَتَّقُواْ وَتُصْلِحُواْ بَيْنَ ٱلنَّاسِ وَٱللَّهُ سَمِيعٌ عَلِيمٌ ﴿٢٢٤﴾ لَّا يُؤَاخِذُكُمُ ٱللَّهُ بِٱللَّغْوِ فِىٓ أَيْمَٰنِكُمْ وَلَٰكِن يُؤَاخِذُكُم بِمَا كَسَبَتْ قُلُوبُكُمْ وَٱللَّهُ غَفُورٌ حَلِيمٌ ﴿٢٢٥﴾﴾

**ڕێگری لە سوێند خواردن لە واز هێنان لە كردارە چاكەكان**

﴿وَلَا تَجْعَلُواْ ٱللَّهَ عُرْضَةً لِّأَيْمَٰنِكُمْ أَن تَبَرُّواْ وَتَتَّقُواْ وَتُصْلِحُواْ بَيْنَ ٱلنَّاسِ وَٱللَّهُ سَمِيعٌ عَلِيمٌ﴾ خودا مەكەن بە كەرەستەی سوێندی خۆتان، كە ڕێگەی چاكەتان لیٚ ببریٚو پارێزكاریتان نەهێڵیٚو بە كاری مەردم ڕانەگەن، خودا دەبیسیٚو زانایە. واتە: سوێند خواردنتان بە خودا واتان لیٚ نەكا وازتان پیٚ بێنیٚ لە چاكەكردنو بەسەر كردنەوەی خزمایەتی ئەگەر سوێندتان خوارد لەسەر نەكردنی. وەك خودای مەزن ئەفەرموێت: ﴿وَلَا يَأْتَلِ أُوْلُواْ ٱلْفَضْلِ مِنكُمْ وَٱلسَّعَةِ أَن يُؤْتُوٓاْ أُوْلِى ٱلْقُرْبَىٰ وَٱلْمَسَٰكِينَ وَٱلْمُهَٰجِرِينَ فِى سَبِيلِ ٱللَّهِ وَلْيَعْفُواْ وَلْيَصْفَحُوٓاْ أَلَا تُحِبُّونَ أَن يَغْفِرَ ٱللَّهُ لَكُمْ﴾[3] با ئەوانەی لە ناوتاندا دەوڵەمەندن سوێندیٚ نەخۆن كە خزمانو هەژارانو كۆچەرییانی ڕێگەی خودا بیٚ بەش بكەن، با چاویان لیٚ بپۆشنو لە هەڵەكانیان ببورن، مەگەر ئێوە حەز ناكەن خودا لە گوناهتان ببوریٚ؟ خودا لە گوناه دەبوریٚو دڵۆڤانە. بەردەوام بوون لەسەر سوێند دەبێتە هۆی گوناهباری خاوەنەكەی،دەرچوون لەو گوناهەش بە كەفارەت دانە بۆ ئەو سوێندە. وەك بوخاری ڕیوایەتی كردوە لە ئەبوهورەیرەوە لە پێغەمبەرەوە(ﷺ) فەرموویەتی: (ئێمە لە دواینەكانینو لە پێشینەكانین لە ڕۆژی قیامەتدا)[4]هەروەها

---

[1] الطبري(٤/٢١٧).

[2] فتح الباري(٩/١٣٨).

[3] النور(٢٢).

[4] فتح الباري(١٢/٤٤١).

پێغەمبەری خودا(ﷺ) فەرموویەتی: (سوێند بە خوا ئەگەر یەکێ لە ئێوە سوور بێت لەسەر ئەو سوێندەی کە دەیخوات لەناو خێزانەکەنیداو سوێندەکەی نەخات تاوانی زیاترە لە لای خودا لەوەی سوێندەکەی بخاتو ئەو کەفارەتەی خوا فەرزی کردوە بیدات) موسلیم ڕیوایەتی کردوە[١] ئەحمەدیش هەر ڕیوایەتی کردوە.[٢] عەلی کوڕی ئەبوتەلحە دەڵێت لە ئیبنوعەبباسەوە لەم ئایەتەدا ﴿وَلَا تَجْعَلُوا اللَّهَ عُرْضَةً لِأَيْمَانِكُمْ﴾ خودا مەکەن بە کەرەستەی سوێندی خۆتان. دەڵێت: خودا مەکەن بە بەرهەڵستی ئەوەی چاکە نەکەن، بەڵکو کەفارەتی سوێندەکەت بدەو چاکە بکە[٣] مەسروقو شەعبیو ئیبراهیمی نەخەعیو موجاهیدو تاوسو سەعیدی کوڕی جوبەیرو عەتاو عیکرمەو مەکحولو زوهریو حەسەنو قەتادەی کوڕی موقاتیلو ئیبنوحەیانو ڕەبیعی کوڕی ئەنەسو زەححاکو عەتای خۆراسانیو سوودی هەر وایان وتوە(ڕەحمەتی خوایان لێ بێ)[٤] ئەوەی ئەم کۆمەڵە زانایانە وتویانە ئەم فەرموودە جەختی لەسەر دەکاتەوە کە لە هەردوو سەحیحەکەدا هاتوە لە ئەبومووسای ئەشعەریەوە(ڕەزای خوای لێ بێ) دەڵێت: پێغەمبەری خودا(ﷺ) فەرموویەتی: ((بەخوا ئەگەر خودا حەز کات)من سوێند لەسەر شتێ ناخۆم پاشان باشتر لەو ببینم مەگین کەفارەتی سوێندەکەم ئەدەمو ئەوە دەکەم کە باشترە)[٥] وە موسلیم ڕیوایەتی کردوە لە ئەبوهورەیرەوە کە پێغەمبەری خودا(ﷺ) فەرموویەتی: (هەرکەسێك سوێندی لەسەر شتێك خواردو پاشان لەوە چاکتری بینی با کەفارەتی بداتو ئەو کارە بکات کە چاکترە)[٦].

## سوێندی سەرزاروکی( لە دەم دەرچوون )

خودای مەزن ئەفەرموێت: ﴿لَا يُؤَاخِذُكُمُ اللَّهُ بِاللَّغْوِ فِي أَيْمَانِكُمْ﴾ خودا بۆ سوێندی سەرزارەکی گوناهتان لەسەر نانووسێ. واتە: سزاو تۆڵەتان لێ ناسێنێ لەسەر سوێندی سەرزارەکی سوێندی سەرزارەکی ئەوەیە کە سوێند خۆر لە دڵەوە ئەو سوێندە ناخوات، بەڵکو لە دەمی دەردەچێو لە دڵیدا نیەو جەختی لەسەر ناکاتەوە، وەك لە هەردوو سەحیحەکەدا هاتوە لە ئەبوهورەیرەوە کە پێغەمبەری خودا(ﷺ) فەرموویەتی: (کەسێ سوێندی خوارد لە سوێندەکەیدا دەڵێت: بە لاتوعوزا با بڵێ: لا إله

---

[١] مسلم(٣/١٢٧٦).

[٢] أحمد(٢/٣١٧)، سەحیحە.

[٣] الطبري(٤/٤٢٢).

[٤] إبن أبي حاتم غ: (٢/٧٠٠-٧٠٢).

[٥] فتح الباري(١١/٥٤٥)، مسلم(٣/١٢٦٨).

[٦] مسلم(٣/١٢٧٢).

إلا الله)[1] ئەمە بە کۆمەڵێکی فەرموو لە چەرخی نەفامیدا چیا بوون‌و تازە موسوڵمان بوون، زمانیان ڕاهاتبوو بە سوێند خواردن بە لات‌و لە دڵیانەوە نەدەهات. فەرمانی پێدان لە دوای ئەوەوە بڵێن(لا إله إلا الله) هەتا ئەو وتەیە بچێتە جێگەی ئەو وەتە، هەر بۆیە خودای مەزن ئەفەرموێت: ﴿وَلَٰكِن يُؤَاخِذُكُم بِمَا كَسَبَتْ قُلُوبُكُمْ﴾ بەلام ئەگەر لە ناوی دڵتانەوە بێ، خودا لێتان دەپرسێتەوە. وە لە ئایەتێکی ترا ئەفەرموێت: ﴿بِمَا عَقَّدتُّمُ ٱلْأَيْمَٰنَ﴾[2] بەلام بە سوێندێ لە ناخی دڵتانەوە بێ‌و نەیبەنە سەر. ئەبوداوود دەڵێت(باب لغو اليمين) پاشان ڕیوایەتی کردوە لە عەتاوە لەبارەی سوێندی سەر زارەکیەوە، دەڵێت: عائیشە دەڵێت: کە پێغەمبەری خودا(ﷺ) فەرموویەتی: (سەرزارەکی لە سوێندا قسەی پیاوێکە لە ماڵی خۆیدا دەڵێ: نە بەخوا، بەڵێ بە خوا)[3] ئیبنوئەبی حاتەم ڕیوایەتی کردوە لە ئیبنوعەبباسەوە، دەڵێت: سوێندی سەرزارەکی(لغوالمين) ئەوەیە تووڕەبی‌و سوێند بخۆی[4] دیسان ڕیوایەت کراوە لە ئیبنوعەبباسەوە دەڵێت: سوێندی سەرزارەکی ئەوەیە، ئەوەی خودا بۆی ڕەوابینیوی تۆ بۆ خۆتی ڕەوا نەبینی، ئەوەتۆ کەفارەتت لەسەر نیە تێیدا.[5] هەر وایش ڕیوایەت کراوە لە سەعیدی کوڕی جوبەیرەوە[6] ئەبوداوود دەڵێت(باب اليمين في الغضب) پاشان ڕیوایەتی کردوە لە سەعیدی کوڕی موسەییبەوە کە: دوو برا لە ئەنساریەکان میراتیەك لە نێوانیاندا بوو، یەکێکیان داوای دابەش کردنی کرد لە ئەوی تریان، ئەویش پێی وت: ئەگەر جارێکی تر داوای دابەش کردنم لێ بکەی هەرچیم هەیە دەیبەمە بەردەم کەعبە دادەنێم، عومەر پێی وت: کەعبەی پیرۆز بێ نیازە لەو ماڵەی تۆ، کەفارەتی سوێندەکەت بدەو قسە لەگەڵ براکەت بکە، بیستومە لە پێغەمبەری خودا(ﷺ) ئەیفەرموو: (سوێندەکەت ناکەوێ، نەزر کردن نیە لەسەر بێ گوێی خودای مەزن‌و لەسەر بڕینی پەیوەندی خزمایەتی‌و لەسەر شتێك کە تۆ خاوەنی نیت)[7] خودای مەزن ئەفەرموێت: ﴿وَلَٰكِن يُؤَاخِذُكُم بِمَا كَسَبَتْ قُلُوبُكُمْ﴾ بەلام ئەگەر لەناخی دڵتانەوە بێ، خودا لێتان دەپرسێتەوە، ئیبنوعەبباس‌و موجاهیدو کەسانی تریش دەڵێن: مەبەست پێی ئەوەیە کەسێك سوێندێ بخوا لەسەر شتێ‌و خۆی بزانێ کە درۆ

---

[1] فتح الباري(١١/٥٤٥)، مسلم(٢/١٢٦٨).

[2] المائدة(٨٩).

[3] أبوداود(٣/٥٧٢)، فەرموودەیەکی سەحیحی مەوقوفە.

[4] إبن أبي حاتم غ: (٢/٧١٦).

[5] إبن أبي حاتم غ: (٢/٧١٥).

[6] إبن أبي حاتم غ: (٢/٧١٥).

[7] أبوداود(٣/٥٨١)، سەنەدەکانی سەحیحە.

دەکا، موجاهیدو کەسانی تریش وتویانە، ئەوە وەك ئەوە وایە کە خودای مەزن ئەفەرموێت: ﴿وَلَٰكِن يُؤَاخِذُكُم بِمَا كَسَبَتْ قُلُوبُكُمْ﴾ بەڵام ئەگەر لە ناخی دڵتانەوە بێ،خودا لێتان دەپرسێتەوە﴿وَاللَّهُ غَفُورٌ حَلِيمٌ﴾ خودا لێبوردەو دلۆڤانە دەربارەی عەبدەکانی.

﴿ لِّلَّذِينَ يُؤْلُونَ مِن نِّسَائِهِمْ تَرَبُّصُ أَرْبَعَةِ أَشْهُرٍ فَإِن فَاءُو فَإِنَّ اللَّهَ غَفُورٌ رَّحِيمٌ (٢٢٦) وَإِنْ عَزَمُوا الطَّلَاقَ فَإِنَّ اللَّهَ سَمِيعٌ عَلِيمٌ (٢٢٧) ﴾

**سوێند خواردن کە لەگەڵیان نەخەون و حوکمەکەی**

خودای مەزن ئەفەرموێت: ﴿ لِّلَّذِينَ يُؤْلُونَ مِن نِّسَائِهِمْ تَرَبُّصُ أَرْبَعَةِ أَشْهُرٍ فَإِن فَاءُو فَإِنَّ اللَّهَ غَفُورٌ رَّحِيمٌ ﴾ ئەو کەسانەی سوێند لە ژنەکانیان دەخۆن کە ئیتر لەگەڵیان نەخەون، دەبێ چوار مانگ چاوەنۆڕ بن ئەگەر گەڕاشنەوە لایان خودا لێبوردەو دلۆڤانە.(الایلاء) واتە سوێند خواردن. ئەگەر پیاوێ سوێندی خوارد کە لەگەڵ ژنەکەی نەخەوێ‌و سەرجێیی نەکا. لەوە بەدەر نیە یان کەمترە لە چوار مانگ یان زیاترە، ئەگەر کەمتر بوو لە چوار مانگ دەبێ چاوەنواڕی تەواو بوونی ماوەکە بکات، پاشان بچێتە لای ژنەکەی. ژنەکە دەبێ خۆڕاگرێ، ئەو ژنە بۆی نیە داوای گەڕانەوە بکات لەو کاتەدا ئەمە وەك لە هەردوو سەحیحەکەدا هاتوە لە عائیشەوە کە پێغەمبەری خودا مانگێ لەگەڵ خێزانەکانی نەخەوت، لە بیست‌و نۆدا هاتەوەو فەرمووی: (مانگ بیست‌و نۆ ڕۆژە)[1] وە لە هەردوو سەحیحەکەدا هەر لە عومەری کوڕی خەتابەوە بەو جۆرە هاتوە[2] بەڵام ئەگەر ماوەکە لە چوار مانگ تێپەڕی، ژنەکە بۆی هەیە داوا لە هاوسەرەکەی بکات دوای چوار مانگەکە، بگەڕێتەوە بۆ لای یان تەڵاقی بدات. دادگایش هاوسەرەکەی ناچار دەکات بۆ ئەوە، بۆ ئەوەی ژنەکە تووشی زیان نەبێ. هەر بۆیە خودای مەزن ئەفەرموێت: ﴿ لِّلَّذِينَ يُؤْلُونَ مِن نِّسَائِهِمْ ﴾ ئەو کەسانەی سوێند لە ژنەکانیان دەخۆن لەگەڵیان نەخەون. واتە: سوێند دەخۆن سەرجێیی لەگەڵ ژنەکانیان نەکەن ئەم ئایەتە بەڵگەیە لەسەر ئەوە کە سوێند خواردن پەیوەندی بە خێزانەوە هەیە نەك کەنیزە(الایماء) وەك ئەوە ڕێبازی کۆی زانایانە ﴿تَرَبُّصُ أَرْبَعَةِ أَشْهُرٍ﴾ دەبێ چوار مانگ چاوەنواڕ بن لە کاتی سوێند خواردنەکەوە، پاشان بوەستێ‌و داوای گەڕانەوە بکات یان تەڵاق دان. هەر بۆیە خودای مەزن ئەفەرموێت: ﴿فَإِن فَاءُو﴾ ئەگەر گەڕانەوەو لەگەڵیان خەوتن‌و سەرجێییان لەگەڵا کردن خودا لێبوردەو دلۆڤانە. ئەمە قسەی ئیبنوعەبباس‌و مەسروق‌و شەعبی‌و

---

[1] فتح الباري(٣٨٠/٨)، مسلم(١١١٣/٢).

[2] فتح الباري(١٤٣/٤)، مسلم(١١١٠).

سعیدی کوڕی جوبەیرو کەسانی تریشە(ڕەحمەتی خوایان لێ بێ)[1]، ﴿فَإِنَّ ٱللَّهَ غَفُورٌ رَّحِيمٌ﴾ بێگومان خودا لێبوردەو دلۆڤانە لەوەی لە پێشدا ڕووی داوە لە کەموکوڕی دەربارەی ئەو ژنانە بە هۆی ئەو سوێندەوە. پاشان خودای مەزن ئەفەرموێت: ﴿وَإِنْ عَزَمُوا۟ ٱلطَّلَٰقَ فَإِنَّ ٱللَّهَ سَمِيعٌ عَلِيمٌ﴾ ئەگەر هەر لەسەر تەلاقیش بڕیاریان دا، ئەوسا خودا دەبیسیێو ئاگاداریشە. ئەم ئایەتە بەلگەیە لەسەر ئەوە، کە تەلاق تەنیا بە تەواو بوونی ئەو چوار مانگە ناکەوێ. وەك مالیك ڕیوایەتی کردوە لە نافیعەوە لە عەبدوڵلای کوڕی عومەرەوە کە دەلێت: کاتێ کە پیاو سوێندی لە ژنەکەی خوارد لەگەڵی نەخەوت با چوار مانگیش تێپەڕێ تەلاقەکەی ناکەوێ هەتا دەوەستێ یان تەلاقی ئەدات یان دەگەڕێتەوە[2] بوخاریش هێناویەتی[3] ئیبنوجەریر ڕیوایەتی کردوە لە سوهەیلی کوڕی ئەبوسالحەوە لە باوکیەوە، دەلێت: پرسیارم کرد لە دوانزە پیاو لە هاوەڵەکانی پێغەمبەر(ﷺ) دەربارەی پیاوێ کە سوێند دەخوا لەگەڵ ژنەکەی نەخەوێ هەموویان دەلێن: هیچ شتێکی لەسەر نیە هەتا چوار مانگ تێدەپەڕێت، پاشان دەوەستێ، ئەگەر گەڕایەوە لە سوێندەکەی چاکە، ئەگەر نەگەڕایەوە تەلاقی ئەدات.[4] دارولقوتنی(الدار القطني) ڕیوایەتی کردوە لە سوهەیلەوە[5] منیش دەلێم: ئەوە ڕیوایەت کراوە لە عومەرو عوسمانو عەلیو ئەبودەرداءو عائیشە دایکی موسولمانانو ئیبنوعومەرو ئیبنوعەبباسو سەعیدی کوڕی موسەییبو عومەری کوڕی عەبدولعەزیزو موجاهیدو تاوسو موحەممەدی کوڕی کەعبو قاسمەوە.

﴿ وَٱلْمُطَلَّقَٰتُ يَتَرَبَّصْنَ بِأَنفُسِهِنَّ ثَلَٰثَةَ قُرُوٓءٍ ۚ وَلَا يَحِلُّ لَهُنَّ أَن يَكْتُمْنَ مَا خَلَقَ ٱللَّهُ فِىٓ أَرْحَامِهِنَّ إِن كُنَّ يُؤْمِنَّ بِٱللَّهِ وَٱلْيَوْمِ ٱلْـَٔاخِرِ ۚ وَبُعُولَتُهُنَّ أَحَقُّ بِرَدِّهِنَّ فِى ذَٰلِكَ إِنْ أَرَادُوٓا۟ إِصْلَٰحًا ۚ وَلَهُنَّ مِثْلُ ٱلَّذِى عَلَيْهِنَّ بِٱلْمَعْرُوفِ ۚ وَلِلرِّجَالِ عَلَيْهِنَّ دَرَجَةٌ ۗ وَٱللَّهُ عَزِيزٌ حَكِيمٌ (٢٢٨) ﴾

**باسی ماوەی تەلاق دراو**

خودای مەزن ئەفەرموێت: ﴿ وَٱلْمُطَلَّقَٰتُ يَتَرَبَّصْنَ بِأَنفُسِهِنَّ ثَلَٰثَةَ قُرُوٓءٍ ﴾ تەلاق دراو لەسەریانە هەتا سێ جارلە بێ نوێژی پاك دەبنەوە چاوەنۆڕ بن. ئەمە فەرمانێکە لەلایەن خودای مەزنەوە ئەو ژنانەی کە چوونەتە لایانو تووشی بێ نوێژی دەبن، دەبێ سێ جار لە بێنوێژی پاك ببنەوەو چاوەنۆڕ

---

[1] الطبري(٤/٤٦٦-٤٦٧).

[2] الوطأ(٢/٥٥٢)، سەحیحە.

[3] فتح الباري(٩/٣٢٥).

[4] الطبري(٤/٤٩٣).

[5] الدار القطني(٤/٦١).

بن. واتە: هەرکەسێ لەوانە دەبێ سێ بێنوێژی دانیشێ دوای ئەوەی مێردەکەی تەڵاقی ئەدات، پاشان ئەگەر ویستی شوو دەکا.

**ماناى بێ نوێژی(القرء)**

سەوری ڕیوایەتی کردوە لە عەلقەمەوە دەڵێت: لە لای عومەری کوڕی خەتاب بووین(ڕەزای خوای لێ بێ) ژنێك هاتە لایی، دەڵێت: مێردەکەی لێی جیا بوەتەوە بە یەك یان بە دوان ئێستا هاتوە بۆ لام، من ئاوەکەم لابردوەو پۆشاکەکەم لابردوەو دەرگای خۆم داخستوە عومەر دەڵێت بە عەبدوڵڵای کوڕی مەسعود، تۆ ڕا چیە؟ دەڵێت: من وادەزانم هێشتا خێزانی ئەو پیاوەیە هەتا بێ نوێژیەکی تری لەسەر لادەچێ. عومەر دەڵێت: منیش هەر وادەزانم،[1] هەر بەو جۆرە ڕیوایەت کراوە لە ئەبوبەکری سدیق و عومەرو عوسمان و عەلی و ئەبودەرداو عوبادەی کوڕی سامیت و ئەنەسی کوڕی مالیك و ئیبنومەسعودو مەعازو ئوبەی کوڕە کەعب و ئەوبوموسای ئەشعەری و ئیبنوعەبباس و سەعیدی کوڕی موسەییب و عەلقەمەوەو ئەسوەدو ئیبراهیم و موجاهیدو عەتاو تاوس و سەعیدی کوڕی جوبەیرو عیکرمەو موحەممەدی کوڕی سیرین و حەسەن و قەتادەو شەعبی و ڕەبیع و موقاتیلی کوڕی حەیان و سوودی و مەکحول و زەححاك و عەتای خۆراسانیەوە کە وتویانە: قورء واتە حەیز(القرء الحيض) ئەم فەرموودەش پشتگیری لێ دەکات کە ئەبوداودو نەسائی ڕیوایەتیان کردوە لە فاتیمەی کچی حوبەیشەوە کە پێغەمبەری خودا(ﷺ) فەرموویە پێی: (واز لە نوێژ کردن بێنە لە ڕۆژەکانی بێ نوێژیتا(أَقرائك))[2] ئەگەر ئەمە سەحیح بێ بەڵگەیە لەسەر ئەوە کە قورء(القرء) حەیزە. بەڵام یەکێ لە ڕاویەکانی کە مونزیرە، ئەبوحاتەم دەربارەی وتویەتی: پیاوێکی نەناسراوە(مجهول) مەشهور نیە بەڵام ئیبنوحبان بە جێ متمانەی داناوە.

**قسەی ژنان وەردەگیرێ لە حەیزو پاك بوونەوەدا**

خودای مەزن ئەفەرموێت: ﴿وَلَا يَحِلُّ لَهُنَّ أَن يَكْتُمْنَ مَا خَلَقَ ٱللَّهُ فِىٓ أَرْحَامِهِنَّ﴾ ڕەوا نیە ئەوەی هەڵیان گرتوە کە خوا خستویەتە ناو زکیانەوە بیشارنەوە. واتە: سك پڕ بوون و یان حەیز، ئەمە قسەی ئیبنوعەبباس و ئیبنوعومەرو موجاهیدو شەعبی و حەکەمی کوڕی عوتبەو ڕەبیعی کوڕی ئەنەس و زەححاك و کەسانی تریشە[3] پاشان خودای گەورە ئەفەرموێت: ﴿إِن كُنَّ يُؤْمِنَّ بِٱللَّهِ وَٱلْيَوْمِ ٱلْآخِرِ﴾ ئەگەر بڕوایان بە خوداو ڕۆژی دوایی هەیە. ئەمە هەڕەشەیە لەو کەسانەی ئەگەر ڕاست نەڵێن، بەڵگەیشە

---

[1] الطبري(٤/٥٠٢).

[2] أبوداود(١/١٩١)، النسائي(٦/٢١١).

[3] إبن أبي حاتم غ: (٢/٧٤٤-٧٤٥).

لەسەر ئەوە کە قسەی ژنان وەردەگیرێ، وە ئەو شتە لەلایەن ئەوانەی نەبێ نازانرێ، چونکە ئاسان نیەو لەلایەن ئەوانەوە نەبێ بەڵگە دەست ناکەوێ، بۆیە کارەکە دەگەڕێتەوە لای ژنان. وە هەڕەشەیان لێ کراوە لەلایەن خوداوە ئەگەر ڕاستی نەڵێن، لەبەر پەلە کردن لەلایەن ئەو ژنەوە هەتا ماوەکەی زوو ڕاگەیەنێ یان بیەوێ ماوەکە درێژ بکاتەوە لەبەر مەبەستێکی خۆی. بۆیە فەرمانی پێکراوە کە ڕاستی بڵێ لەو بارەیەوە بە بێ کەم‌و زیاد کردن.

## بۆ هێنانەوەیان مێرد شایستە ترە

خودای مەزن ئەفەرموێت: ﴿وَبُعُولَتُهُنَّ أَحَقُّ بِرَدِّهِنَّ فِي ذَٰلِكَ إِنْ أَرَادُوٓاْ إِصْلَٰحًا﴾ لەم نێوانەدا ئەگەر بیانەوێ ڕێك کەون بۆ دیسان هێنانەوەیان مێردەکانیان شیاو ترن. مادام ئەو ژنە لە ماوەی خۆیدایە(في عدتها) ئەگەر پیاوەکە بیەوێ ڕێك کەوێ‌و مەبەستی چاکەی هەیە. ئەمە بۆ هێنانەوەکانە(في الرجعيات) بەڵام ئەوانەی تەڵاق دراوە جیابوەکان(البوائن) لە کاتی هاتنە خوارەوەی ئەم ئایەتەدا تەڵاق دراوی بائن نەبوە، ئەمە کاتێ پەیدا بوو کاتێ کە تەڵاقی سێ بەسێ(الثلاث) قەتیس کرد، وە لەکاتی هاتنە خوارەوەی ئەم ئایەتەدا، بۆ هێنانەوەی ژنەکان مێردەکانیان شایستە تر بوون، با سەد جاریش تەڵاقی دابێ مادام لە عیدەدا بووبێ، بەڵام دوای ئەوە کە ئەو ئایەتەی پاش ئەم ئایەتە هاتە خوارەوە، هاتنە سەر سێ تەڵاق، هەر بۆیە بۆ خەڵکی وای لێ هات، بوو بە تەڵاق دراوی بائن‌و عەزیزە بائن.

## مافەکانی ژن‌و مێرد

خودای مەزن ئەفەرموێت: ﴿وَلَهُنَّ مِثْلُ ٱلَّذِى عَلَيْهِنَّ بِٱلْمَعْرُوفِ﴾ ژنان هەروەك ئەرکی ژنانەی خۆیان لەسەر شانە، ژنەکانیش مافی ڕوای خۆیان هەیە، واتە: ژنانیش مافی خۆیان لەسەر پیاوان هەیە، وەك چۆن پیاوان مافی خۆیان هەیە لەسەر ژنان، دەبێ هەرکەسەو مافی ئەوی تر بەجێ بێنێ بەو پێیەی لەسەری دانراوەو ڕوایە. وەك لە سەحیحی موسلیما هاتوە لە جابیرەوە کە پێغەمبەری خودا(ﷺ) لە حەجی ماڵ ئاوایدا لە وتارەکەیدا فەرموویەتی: (لە خوا بترسن دەربارەی ئافرەتان، چونکە بەڕاستی ئێوە بە ڕاسپاردەی خوایی وەرتان گرتوون، بە وتەی خوا حەڵاڵ بوون بۆتان، مافی ئێوەیە لەسەریان هیچ کەسێك نەهێننە سەر جێگاتانەوە کە ئێوە پێتان ناخۆش بێت، ئەگەر وایان نەکرد لێیان بدەن بە لێدانێکی سووك، وە مافی ئەوانە لەسەرتان دابین کردنی خۆراك‌و پۆشاکیان بە چاکی)[1]، وە لە فەرموودەکەی یەهزی کوڕی حەکیمەوە لە مەعاویەی کوڕی حەیدەی قەشیریەوە(حَيْدَة القشيري) لە باوکیەوە لە باپیریەوە دەڵێت: ئەی پێغەمبەری خودا(ﷺ) هەقی ژنی هەرکێ لەئێمە چیە؟ فەرمووی: (کاتێ خواردنت خوارد خواردنی بدەیتێ‌و پۆشاکت لەبەر کرد پۆشاکی لەبەر بکەی‌و لە دەم‌و چاوی

---

[1] مسلم(٢/٨٨٦).

ئەدەی‌و قسەی ناشیرینی پێ مەڵێ‌و لێی جیا مەبەوە مەگین لە ناو ماڵدا)[1]، وەکیع دەڵێت لە بەشیری کوڕی سولەیمانەوە، لە عیکرمەوە لە ئیبنوعەبباسەوە، دەڵێت: من پێم خۆشە بە سەنگینی مامەڵە لەگەڵ ژن بکەم وەك چۆن پێم خۆشە بە سەنگینی ژن مامەڵەم لەگەڵ بکات چونکە خودای مەزن ئەفەرموێت: ﴿وَلَهُنَّ مِثْلُ الَّذِي عَلَيْهِنَّ بِالْمَعْرُوفِ﴾ ژنان هەروەك ئەرکی ژنانەی خۆیان لەسەر شانە، ژنەکانیش مافی ڕەوای خۆیان هەیە. ئیبنوجەریرو ئیبنوئەبی حاتەمیش ڕیوایەتیان کردوە[2].

## ڕێزی پیاوان لەسەر ژنان

خودای مەزن ئەفەرموێت: ﴿وَلِلرِّجَالِ عَلَيْهِنَّ دَرَجَةٌ﴾ پیاوانیش لە ژنان پلەیەك بەرەو ژوورترن. واتە: لە ڕێزداو لە وەدی هێنان‌و ڕەوشت‌و پلەو گوێڕایەڵی فەرمان‌و بەخشین‌و هەڵسان بە چاکسازی‌و قەدر لە دنیاو لە قیامەتا پلە بەرزترن، وەك خودای مەزن لە ئایەتێکی ترا فەرموویەتی: ﴿الرِّجَالُ قَوَّامُونَ عَلَى النِّسَاءِ بِمَا فَضَّلَ اللَّهُ بَعْضَهُمْ عَلَى بَعْضٍ وَبِمَا أَنْفَقُوا﴾[3] پیاوان بەسەر ژناندا دەستەڵاتیان هەیە، کە خودا ڕێزی هەندێکی داوە بەسەر هەندێکیدا لە وەدی هێناندا دیارە پیاوان ئەرکی بەڕێ چوونی ماڵیان لەسەر شانە.

﴿الطَّلَاقُ مَرَّتَانِ فَإِمْسَاكٌ بِمَعْرُوفٍ أَوْ تَسْرِيحٌ بِإِحْسَانٍ وَلَا يَحِلُّ لَكُمْ أَنْ تَأْخُذُوا مِمَّا آتَيْتُمُوهُنَّ شَيْئًا إِلَّا أَنْ يَخَافَا أَلَّا يُقِيمَا حُدُودَ اللَّهِ فَإِنْ خِفْتُمْ أَلَّا يُقِيمَا حُدُودَ اللَّهِ فَلَا جُنَاحَ عَلَيْهِمَا فِيمَا افْتَدَتْ بِهِ تِلْكَ حُدُودُ اللَّهِ فَلَا تَعْتَدُوهَا وَمَنْ يَتَعَدَّ حُدُودَ اللَّهِ فَأُولَئِكَ هُمُ الظَّالِمُونَ (٢٢٩) فَإِنْ طَلَّقَهَا فَلَا تَحِلُّ لَهُ مِنْ بَعْدُ حَتَّى تَنْكِحَ زَوْجًا غَيْرَهُ فَإِنْ طَلَّقَهَا فَلَا جُنَاحَ عَلَيْهِمَا أَنْ يَتَرَاجَعَا إِنْ ظَنَّا أَنْ يُقِيمَا حُدُودَ اللَّهِ وَتِلْكَ حُدُودُ اللَّهِ يُبَيِّنُهَا لِقَوْمٍ يَعْلَمُونَ (٢٣٠)﴾

## ئەوپەڕی تەلاق سێ جارەو ڕوون کردنەوەی گەڕانەوەو دەس لێك بەردان

خودای مەزن ئەفەرموێت: ﴿الطَّلَاقُ مَرَّتَانِ فَإِمْسَاكٌ بِمَعْرُوفٍ أَوْ تَسْرِيحٌ بِإِحْسَانٍ﴾ تەلاقی ژن دوو کەڕەتە، ئەوسا یان ڕاگرتنی باش‌و خوا پەسەند یان بە خۆشی‌و بێ هەرا دەس لێك بەردانە. ئەم ئایەتە پیرۆزە ئەو کارەی لە سەرەتای ئیسلامدا هەبوو هەڵی گرت، کە پیاو شایستە تر بوو بە گەڕانەوەی ژنەکەی خۆی با سەد جاریش تەلاقی دابێت، مادام لە عیدەدا مابێتەوە ژنەکە. کاتێ کە ئەمە زیانی تێدا بوو بۆ ژنان، خودای گەورە ئەوپەڕی تەلاقی کردە سێ جار. ڕێگەی گەڕانەوەی دا لە

---

[1] أبوداود(٢/٦٠٦)، فەرموودەیەکی حەسەنە.

[2] الطبري(٤/٥٣٢)، إبن أبي حاتم غ: (٢/٧٥٠).

[3] النساء(٣٤).

جاری یەکەمو دووهەمدا، لە سێهەم جاردا بڕیاری جیا بوونەوەی بە تەواوی داو ئەفەرموێت: ﴿ٱلطَّلَٰقُ مَرَّتَانِۖ فَإِمۡسَاكُۢ بِمَعۡرُوفٍ أَوۡ تَسۡرِيحُۢ بِإِحۡسَٰنٖ﴾ تەلاقی ژن دوو کەڕەتە، ئەوسا یان ڕاگرتنی باشو حوا پەسەندانە یان بە خۆشیو بێ هەرا دەس لێك بەردانە. ئەبوداوود (ڕەحمەتی خوای لێ بێ) لە سونەنەکەیدا: (باب نسخ المراجعة بعد الطلقات الثلاث) ڕیوایەتی کردوە لە ئیبنوعەبباسەوە ﴿وَٱلۡمُطَلَّقَٰتُ يَتَرَبَّصۡنَ بِأَنفُسِهِنَّ ثَلَٰثَةَ قُرُوٓءٖۚ وَلَا يَحِلُّ لَهُنَّ أَن يَكۡتُمۡنَ مَا خَلَقَ ٱللَّهُ فِيٓ أَرۡحَامِهِنَّ﴾ تەلاق دراو لە سەریانە هەتا سێ جار لە بێ نوێژی پاك دەبنەوە چاوەنۆڕ بن، ڕوا نیە لەو سکەی خودا خستویەتە زکیانەوە بیشارنەوە دەڵێت: لەبەر ئەوە کاتێ کە پیاو ژنەکەی تەلاق بدایە، ئەو شایستە تر بوو بۆ گەڕانەوەی ژنەکەی، با سێ جاریش تەلاقی بدایە. ئەم ئایەتە کە خودای مەزن ئەفەرموێت: ﴿ٱلطَّلَٰقُ مَرَّتَانِ﴾ تەلاقی ژن دوو کەڕەتە. ئەوەی نەسخ کردەوەو[1] نەسائیش ڕیوایەتی کردوە[2] ئیبنوئەبی حاتەم ڕیوایەتی کردوە لە عوروەوە کە پیاوێ دەڵێت بە ژنەکەی خۆی: هەرگیز تەلاقت نادەمو ناتگرمە خۆشم، ژنەکە دەڵێت: ئەوە چۆن دەبێ؟ دەڵێت: تەلاقت ئەدەم هەتا ماوەکەت نزیك دەبێتەوە دەتگێڕمەوە، ژنەکە هات بۆ خزمەت پێغەمبەری خودا(ﷺ) ئەوی بۆ گێڕاوە، خودای گەورە ئەم ئایەتەی ناردە خوارەوە: ﴿ٱلطَّلَٰقُ مَرَّتَانِ﴾ تەلاق دراو دوو کەڕەتە.[3] ئیبنوجەریریش هەر وا ڕیوایەتی کردوە لە تەفسیرەکەیدا[4] پاشان خودای مەزن ئەفەرموێت: ﴿فَإِمۡسَاكُۢ بِمَعۡرُوفٍ أَوۡ تَسۡرِيحُۢ بِإِحۡسَٰنٖ﴾ ئەوسا یان ڕاگرتنی باشو خوا پەسەندانە، یان خۆشی بێ هەرا، دەس لێك بەردانە. واتە: ئەگەر جارێ یان دوو جار تەلاقت دا تۆ ئارەزووی خۆتە، مادام لە عیدەدایە، دەتوانی بیگێڕیتەوە ئەگەر بتەوێ چاکەی لەگەڵا بکەیو هەوڵی باشکردنی بدەی یان وازی لێ بێنی هەتا ماوەکەی تەواو دەبێو لێت جیا دەبێتەوەو ئازادی دەکەی بە چاکی لەگەڵی دەجوڵێیتەوەو هیچ ناهەقیەکی پێ ناکەیو تووشی زیانی ناکەی. عەلی کوڕی ئەبوتەلحە دەڵێت لە ئیبنوعەبباسەوە دەڵێت: کاتێ پیاوێ ژنەکەی دوو جار تەلاق دا، با لە خودا بترسێ لەوەدا، واتە: لە سێهەم جاردا، با بە باشیو خوا

[1] أبوداود(٢/٦٤٤)، سەنەدەکانی حەسەنە.

[2] النسائي(٦/٢١٢)، سەنەدەکانی حەسەنە.

[3] إبن أبي حاتم غ: (٢/٧٥٤).

[4] الطبري(٤/٥٣٩).

پەسەندانە ڕابگریێ و لەگەڵی هەڵسو کەوت بکات یان بە خۆشیو بێ هەرا دەستی لێ بەرداو لە هیچ هەقێکیدا ستەمی لێ نەکا[1].

**قەدەغەکردنی وەرگرتنەوەی مارەیی**

خودای مەزن ئەفەرموێت: ﴿وَلَا يَحِلُّ لَكُمْ أَن تَأْخُذُوا۟ مِمَّآ ءَاتَيْتُمُوهُنَّ شَيْـًٔا﴾ لەو ماڵەی کە پێتان داون ڕوا نیە هیچیان لێ وەرگرنەوە. واتە: بۆتان ڕوانیە هەراسانیان بکەنو تەنگیان پێ هەڵچنن بۆ ئەوەی واز لەو مارەییە یان هەندێکی بێنن بۆتان کە پێتان داون، وەك خودای گەورە ئەفەرموێت: ﴿وَلَا تَعْضُلُوهُنَّ لِتَذْهَبُوا۟ بِبَعْضِ مَآ ءَاتَيْتُمُوهُنَّ إِلَّآ أَن يَأْتِينَ بِفَٰحِشَةٍ مُّبَيِّنَةٍ﴾[2] نابێ زۆریشیان بۆ بێنن برێك لەوەی پێتان داون دیسان لێیان بسێننەوە، جا مەگین هەر بە ئاشکرا کاری داوێن پیسی بکەن. بەڵام ئەگەر ژنەکە بە ئارەزوی خۆی هەندێکی لەو مارەییە گێڕایەوەو پێی بەخشیەوە خودای گەورە ئەفەرموێت: ﴿فَإِن طِبْنَ لَكُمْ عَن شَىْءٍ مِّنْهُ نَفْسًا فَكُلُوهُ هَنِيٓـًٔا مَّرِيٓـًٔا﴾[3] ئەگەر ئەوان هەر بە ئارەزوی خۆیان شتێکیان لە مارەییەکە بە ئێوە بەخشی، بیخۆنو نۆشی گیانتان بێ.

**ئیزندان بە خۆ ئازاد کردنو( الخلع ) گەڕانەوەی مارەیی لەو خۆ ئازاد کردنەدا**

بەڵام کاتێ پیاوو ژنەکە هەر کێشەیان بوو، ژنەکە بە هەقو مافی پیاوەکە هەڵنەدەساو قینی لێی بووە نەی دەتوانی ژیانی هاوسەری لەگەڵ بەسەر بەرێت، لەو کاتەدا ژنەکە دەتوانێ خۆی بکڕێتەوە بەو مارەییەی پیاوەکەی پێی داوە، هیچ گوناهی ناگا کە ئەوەی مارەییەی ئەداتەوە بە پیاوەکەی خۆی. پیاوەکەیش هیچ گوناهی ناگا کە لێی وەردەگرێتەوە. هەر بۆیە خودای مەزن ئەفەرموێت: ﴿وَلَا يَحِلُّ لَكُمْ أَن تَأْخُذُوا۟ مِمَّآ ءَاتَيْتُمُوهُنَّ شَيْـًٔا إِلَّآ أَن يَخَافَآ أَلَّا يُقِيمَا حُدُودَ ٱللَّهِ ۖ فَإِنْ خِفْتُمْ أَلَّا يُقِيمَا حُدُودَ ٱللَّهِ فَلَا جُنَاحَ عَلَيْهِمَا فِيمَا ٱفْتَدَتْ بِهِۦ﴾ لەو ماڵەی کە پێتان داوون ڕوا نیە هیچیان لێ وەرگرنەوە، مەگین ترسیان لەوە هەبێ کە نەتوانن سنوری خودا بپارێزن، ئەگەر ترستان لەوە هەبوو کە هەردووکیان سنووری خوا ناپارێزن، هیچ گوناهی تێدا نیە ژنەکە خۆی بکڕێتەوە. بەڵام ئەگەر ژنەکە هیچ بیانوویەکی نەبوو، داوای لە پیاوەکەی کرد کە دەیەوێ خۆی بکڕێتەوە، ئیبنوجەریر ڕیوایەتی کردوە لە سوبانەوە(ثوبان) کە پێغەمبەری خودا(ﷺ) فەرموویەتی: (هەر ژنێك داوای تەڵاق بکات لە مێردەکەی بەبێ هیچ تاوانو

[1] الطبري(٤/٣٦٧).

[2] النساء(١٩).

[3] النساء(٤).

خراپەیەك، بۆنی بەهەشتی لێ حەرام دەبێ)[1]، تیرمیزیش ڕیوایەتی کردوەو دەڵێت: فەرموودەیەکی حەسەنە[2] ئیبنوجەریر باسی کردوە کە ئەم ئایەتە دەربارەی سابتی کوڕی قەیسی کوڕی شەمماس و ژنەکەی حەبیبەی کچی عەبدوڵڵای کوڕی ئوبەیی کوڕی سەلول هاتۆتە خوارەوە[3]، وە ئیمامی مالیك لە مۆتەئدا(موطأ) ڕیوایەتی کردوە لە حەبیبەی کچی سەهلی ئەنسارییەوە کە ژنی سابتی کوڕی قەیسی کوڕی شەمماس بووە، کە پێغەمبەری خودا(ﷺ) دەرچوو بۆ نوێژی بەیانی حەبیبەی کچی سەهلی لەبەر دەرگادا بینی لە بومو لێوا(في الغلس) پێغەمبەری خودا(ﷺ) فەرمووی: (تۆ کێیت؟) دەڵێت: من حەبیبەی کچی سەهلم ئەی پێغەمبەری خودا(ﷺ) فەرمووی: (کارت چیە؟) دەڵێت: نە منو نە سابتی کوڕی قەیس، واتە مێردەکەی، کاتێ کە سابتی کوڕی قەیسی مێردی هات پێغەمبەری خودا(ﷺ) پێی وت: (ئەمە حەبیبەی کچی سەهلە ئەوەندە قسەی خودا دەزانێ چەندە قسەی کرد، واتە: قسەی زۆری کرد)، پاشان حەبیبە دەڵێت: ئەی پێغەمبەری خودا هەرچی پێداوم(لە مارەیی) لە لامە. پێغەمبەری خودا(ﷺ) فەرمووی: (لێی وەرگرەوە) پیاوەکەی هەمووی لێ وەرگرتەوە، حەبیبە لە ماڵی کەس و کاریا دانیشت[4] ئیمامی ئەحمەدیش هەروا ڕیوایەتی کردوە[5] ئەبوداوودیش[6] نەسائیش[7] بوخاری ڕیوایەتی کردوە لە ئیبنوعەبباسەوە، کە ژنەکەی سابتی کوڕی قەیسی کوڕی شەمماس هات بۆ خزمەت پێغەمبەر(ﷺ) دەڵێت: ئەی پێغەمبەری خودا(ﷺ) هیچ ڕەخنەیەکم لە دینو ڕەوشتیا نیە، بەڵام کوفرم(الكفر) لە ئیسلامدا پێ ناخۆشە. پێغەمبەری خودا(ﷺ) فەرمووی: (ئایا مارەییەکەی بۆ دەگێڕیتەوە؟) دەڵێت: بەڵێ، پێغەمبەری خودا(ﷺ) فەرمووی: (مارەییەکەی لێ وەرگرەوەو بە یەك تەلاق، تەلاقی بدە)[8] هەروایش نەسائی ڕیوایەتی کردوە[9].

---

[1] الطبري(٤/٥٦٩).

[2] تحفة الاحوذي(٤/٣٦٧)، فەرموودەیەکی حەسەنە.

[3] الطبري(٤/٥٥٦).

[4] الموطأ(٢/٥٦٤)، فەرموودەیەکی سەحیحە.

[5] احمد(٦/٤٣٣)، سەحیحە.

[6] أبوداود(٢/٦٦٧)، سەحیحە.

[7] النسائي(٦/١٦٩)، سەحیحە.

[8] فتح الباري(٩/٣٠٦).

[9] النسائي(٦/١٦٩)، سەحیحە.

### عیددەی ئەو ژنەی خۆی دەکڕێتەوە( المختلم )

تیرمیزی ڕیوایەتی کردوە لە ڕوبەیعی(الرُّبَيِّع) کچی موعەوزی(مُعَوِّذُ) کوڕی عەفرائەوە(عفراء) کە خۆی کڕیوەتەوە لە سەردەمی پێغەمبەری خوادا(ﷺ)پێغەمبەری خودا(ﷺ) پێیدا، یان فەرمانی پێکرا کە عیددەکەی یەك حەیز بێ[1].

### دەرچوون لە سنووری خودا ناهەقیە

خودای مەزن ئەفەرموێت: ﴿تِلْكَ حُدُودُ اللَّهِ فَلَا تَعْتَدُوهَا﴾ ئەمانەن سنووری خودا، لە سنووری خودا دەرمەچن، ئەو کەسانەی لە سنووری خودا دەردەچن، ئەوانەن کە ستەم دەکەن. واتە: ئەمە شەریعەتی خودایە کە بۆی داناون‌و سنورەکانی ئەون لێی دەرمەچن. وەك لە فەرمودەی سەحیحا هاتوە: (بێگومان خودا چەند سنوورێکی بۆ داناون لێی دەرمەچن، وە چەند فەرزێکیشی لەسەر داناون لە دەست خۆتانی مەدەن، چەند قەدەغەیەکی داناوە مەیبەزێنن، بێدەنگیش بوولەچەندشت بەزەییەك بۆئێوەو لەبیر نەچوە ئێوەش پرسیار دەربارەی مەکەن)[2].

### بەیەك جار سێ تەڵاقدان لە یەك دانیشتندا حەرامە

ئەم ئایەتە کراوە بە بەڵگە لەسەر ئەوە کە کۆکردنەوەی سێ تەڵاق بە یەك کەڕەت حەرامە. وە ئەم فەرموودە مەحمودی کوڕی لەبید کە نەسائی ڕیوایەتی کردوە لە سونەنەکەیدا کە دەڵێت: هەواڵ درا بە پێغەمبەری خودا(ﷺ) دەربارەی پیاوێ ژنەکەی سێ تەڵاقە دا بەیەك جار. بە تورەیی هەڵساو فەرمووی: (ئایا گەمە بە کتێبی خودا دەکرێ‌و من لە نێوانتاندام؟) هەتا پیاوێ هەڵساو دەڵێت: ئەی پێغەمبەری خودا ئایا نەیکوژم[3]؟

### گەڕانەوە نیە دوای تەڵاقدانی سێهەم

خودای مەزن ئەفەرموێت: ﴿فَإِن طَلَّقَهَا فَلَا تَحِلُّ لَهُ مِنۢ بَعْدُ حَتَّىٰ تَنكِحَ زَوْجًا غَيْرَهُۥ ۗ فَإِن طَلَّقَهَا فَلَا جُنَاحَ عَلَيْهِمَآ أَن يَتَرَاجَعَآ إِن ظَنَّآ أَن يُقِيمَا حُدُودَ اللَّهِ ۗ وَتِلْكَ حُدُودُ اللَّهِ يُبَيِّنُهَا لِقَوْمٍ يَعْلَمُونَ﴾ ئەگەر ئەم دوو جارەش تەڵاقی دا ژنەکەی بۆ حەڵاڵ نیە، هەتا ژنەکەی دەچێ مێردێکی تر دەکا. واتە: ئەگەر پیاوێ ژنەکەی خۆی سێهەم تەڵاق دا، دوای ئەوە دوو تەڵاقەی تری دابوو، ئەو ژنە لێی حەرام دەبێ ﴿حَتَّىٰ تَنكِحَ زَوْجًا غَيْرَهُۥ﴾ هەتا ئەو ژنە دەچێ مێردێکی تر دەکاو پیاوێکی تر سەرجێیی لەگەڵا دەکات بە مارەبڕینێکی سەحیح. خۆ ئەگەر کەسێکی تر سەرجێیی لەگەڵا کردو نیکاحەکەی تەواو نەبوو با کەنیزەیش بێ هەر بۆ یەکەم

---

[1] تحفة الاحوذي(٤/٣٦٣)، فەرموودەیەکی باشە(جيد).

[2] الدار القطني(٤/٢٩٨)، سەحیحە.

[3] النسائي(٦/١٤٢)، فەرموودەیەکی لاوازە.

حەلاڵ نابێ. چونکە ئەوە بە هاوسەر دانانرێ، ئەگەر شوی کرد بەلام ئەو کەسە سەرجێیی لەگەلا نەکرد هەر بۆ مێردی یەکەم حەلاڵ نابێتەوە. موسلیم لە سەحیحەکەیدا ڕیوایەتی کردوە لە عائیشەوە کە پێغەمبەری خودا(ﷺ) پرسیاری لێ کرا دەربارەی ژنێ پیاوێ مارەی دەکا، پیاوێکی تر مارەی دەکاو تەلاقی ئەدات پێش ئەوە سەرجێیی لەگەلا بکا. ئایا حەلاڵ دەبێتەوە بۆ مێردی پێشووی؟ فەرمووی: (نەخێر هەتا سەرجێیی لەگەلا نەکا)[1] بوخاریش ڕیوایەتی کردوە[2] دیسان ئیمامی ئەحمەد ڕیوایەتی کردوە لە عائیشەوە، دەڵێت: ژنەکەی ڕوفاعەی قورەزی(القُرظي) هاتە ژوورەوە منو ئەبوبەکر لە خزمەت پێغەمبەرا بووین(ﷺ) دەڵێت: ڕەفاعە بە تەواوی تەلاقی دام، عەبدوڕەحمانی کوڕی جوبەیر مارەی کردوم(لە پیاوەتی کەوتوە) وەك ئەم پەڕۆیە وایە، ژنەکە چمکێکی کراسەکەی خۆی گرت. خالیدی کوڕی سەعیدی کوڕی عاس لە دەرگای ژوورەکەدا بوو، مۆڵەتی نەدرا بێتە ژوورەوە خالید دەڵێت: ئەرێ ئەبوبەکر بۆ هەڵناشاخێیت بەسەر ئەو ژنەدا کە بەو ڕووهەڵمااراویە قسە لەگەل پێغەمبەر(ﷺ) دەکا. پێغەمبەر(ﷺ) پێکەنو فەرمووی: (پێ دەچێ حەز بکەی بگەڕێیتەوە بۆ لای ڕەفاعە. نەخێر نابێ هەتا تۆ چێژ لەو وەرنەگریتو ئەویش چێژ لە تۆ وەرنەگرێت)[3] بوخاری ڕیوایەتی کردوە[4] موسلیمش ڕیوایەتی کردوە[5]، موسلیم دەڵێت: ڕەفاعە دواین تەلاقی بوو کە سێهەم تەلاق بوو. نەسائیش ڕیوایەتی کردوە[6]، مەبەست بە(العُسيلة) سەرجێیی کردنە. وەك ئیمامی ئەحمەدو نەسائی ڕیوایەتیان کردوە لە عائیشەوە(ڕەزای خوای لێ بێ) کە پێغەمبەری خودا(ﷺ) فەرمووی: (ئەوسا بزانن(العُسيلة) یەرجێیی کردنە(الجماعْ))[7].

### نەفرین لەو کەسەی بۆی حەلاڵ دەکاو ئەو کەسەیش بۆی حەلاڵ کراوە دوای تەلاقدانی سێهەم

مەبەست بە مێردی دووهەم ئەوەیە کە دەیەوێت ئەو ژنە بخوازێو درێژە بە ژیان بدات لەگەڵی وەك چۆن ڕێی پێدراوە لە هاوسەرگیریدا. بەلام ئەگەر، ئەو کەسە دوای سێ تەلاقە بیەوێ ئەو ژنە مارە بکات بۆ ئەوەی حەلاڵی کاتەوە بۆ پیاوی یەکەم، ئەوە ئەو کەسەیە کە چەندین فەرموودە هاتوە دەربارەیی‌و زەمی کردوەو نەفرینیشە لێ کردوە، هەرکاتێ نیازی وا بوو ئەو عەقدە وا بکات

---

[1] مسلم(١٠٥٧/٢).

[2] فتح الباري(٢٨٤/٩).

[3] أحمد(٣٤/٦)، سەحیحە.

[4] فتح الباري(٥١٨/١٠).

[5] مسلم(١٠٥٧/٢).

[6] النسائي(١٤٦/٦)، سەحیحە.

[7] أحمد(٦٢/٦)، لە مەوقوفەوە نزیکە.

نیکاحەکەی بەتاڵ دەبێتەوە لەلای کۆی ئیمامەکان(جمهور الأئمة) ئیمامی ئەحمەد ڕیوایەتی کردوە لە عەبدوڵڵاوە، دەڵێت: پێغەمبەری خودا(ﷺ) نەفرینی کردوە لە خاڵ کوتو ئەو ئافرەتەی خاڵی بۆ دەکوتێ، لەوەیش قژ دەلکێنیو ئەو ئافرەتەیش قژەکەی بۆ دەلکێنن،(المحلّل و المحلل له) ئەوە بۆی حەلاڵ کردوەو ئەوە بۆی حەلاڵ کردوە، ئەوە سوو خۆرو ئەوەیش سوو دەرە[1]. تیرمیزیو نەسائیش ڕیوایەتیان کردوە[2] تیرمیزی دەڵێت: ئەم فەرموودە حەسەنی سەحیحە، دەڵێت: کاربەمەکراوە لە لای زانایان لە هاوەڵانی پێغەمبەر(ﷺ) لەوانە عومەرو عوسمانو ئیبنوعومەر، وە ئەمە قسەی زانایانی پێشینەشە، ڕیوایەتیش کراوە لە عەلیو ئیبنومەسعودو ئیبنوعەبباسیشەوە. وە حاکیم ڕیوایەتی کردوە لە موستەدرەکەکەیدا لە نافیعەوە، دەڵێت: پیاوێ هات بۆ لای ئیبنوعومەر پرسیاری لێکرد دەربارەی پیاوێ ژنەکەی سێ تەلاقە داوە، برایەکی مارەی کردوە بێ ئەوەی پرسو ڕای بە ئەو کردبێ، پاشان تەلاقی ئەدات بۆ براکەی ئایا ئەو ژنە بۆ یەکەم حەلالە؟ (ئیبنوعومەر) دەڵێت: نەخێر مەگین نیکاحێ بە ئارەزوو بووبێ. ئێمە ئەو کەسەمان بە سەفاح دادەنا لە سەردەمی پێغەمبەرا(ﷺ) پاشان دەڵێت: ئەم فەرموودە سەنەدەکەی سەحیحە[3]. هەر بەو جۆرە ئەبوبەکری کوڕی ئەبوشەیبەو جوزرجانیو حەربی کرمانیو ئەبوبەکری ئەسرەم(الاثرم) ڕیوایەتیان کردوە لە قەبیسەی کوڕی جابیرەوە لە عومەرەوە، دەڵێت: هیچ حەلاڵ کەرو حەلاڵ بۆ کراویە نایەتە لام مەگین بەردەبارانم کردوون.(ڕەجمم کردوون)[4].

## کەی ئەو ژنە کە سێ تەلاقە دراوە حەلاڵ دەبێتەوە بۆ هاوسەری یەکەمی

خودای مەزن ئەفەرموێت: ﴿فَإِن طَلَّقَهَا﴾ ئەگەر لەو مێردەی کردشیە تەلاق درا. دوای سەرجێیی کردن لەگەڵی ﴿فَلَا جُنَاحَ عَلَيْهِمَآ أَن يَتَرَاجَعَآ﴾ ئەوساکە هیچ گوناهێکیان لەسەر نیە دووبارە بگەڕێنەوە بۆ لای یەکتر. واتە: ئەو پیاوو ژنە ﴿إِن ظَنَّآ أَن يُقِيمَا حُدُودَ ٱللَّهِ﴾ بەو مەرجە کە وا بزانن هەردووکیان بە شێوەیەکی ڕەوا(وەك خوا فەرمانی داوە) لەگەڵ یەك هەڵدەکەن. واتە: بەچاکی لەگەڵ یەك دەژین. موجاهید دەڵێت:ئەگەر زانیان مارەبڕینەکەیان هیچ فڕوفێڵێکی تێدا نیە[5]، ﴿وَتِلْكَ حُدُودُ ٱللَّهِ يُبَيِّنُهَا لِقَوْمٍ

---

[1] أحمد(١/٤٨٨)، سەحیحە.

[2] أحمد(١/٤٨٨)، تحفة الاحوذي(٤/٢٦٤)، النسائي(٦/١٤٩)، سەحیحە.

[3] الحاكم(٢/١٩٩).

[4] أبن أبي شيبة(٤/٢٩٤).

[5] الطبري(٤/٥٩٨).

يَعْلَمُونَ﴾ ئەمانە سنووری خودان، ڕوونیان دەکاتەوە بۆ ئەو کەسانە وا حاڵی دەبن. واتە: ڕێبازو فەرمانی خودان، خودا ڕوونو ئاشکرای دەکات بۆ ئەوانەی دەزانن‌و تێدەگەن.

﴿وَإِذَا طَلَّقْتُمُ ٱلنِّسَآءَ فَبَلَغْنَ أَجَلَهُنَّ فَأَمْسِكُوهُنَّ بِمَعْرُوفٍ أَوْ سَرِّحُوهُنَّ بِمَعْرُوفٍۚ وَلَا تُمْسِكُوهُنَّ ضِرَارًا لِّتَعْتَدُوا۟ۚ وَمَن يَفْعَلْ ذَٰلِكَ فَقَدْ ظَلَمَ نَفْسَهُۥۚ وَلَا تَتَّخِذُوٓا۟ ءَايَٰتِ ٱللَّهِ هُزُوًاۚ وَٱذْكُرُوا۟ نِعْمَتَ ٱللَّهِ عَلَيْكُمْ وَمَآ أَنزَلَ عَلَيْكُم مِّنَ ٱلْكِتَٰبِ وَٱلْحِكْمَةِ يَعِظُكُم بِهِۦۚ وَٱتَّقُوا۟ ٱللَّهَ وَٱعْلَمُوٓا۟ أَنَّ ٱللَّهَ بِكُلِّ شَىْءٍ عَلِيمٌ ﴿٢٣١﴾﴾

## فەرماندان بە چاکە هەڵس‌وکەوت کردن لەگەڵ ژنی تەڵاق دراو

خودای مەزن ئەفەرموێت: ﴿وَإِذَا طَلَّقْتُمُ ٱلنِّسَآءَ فَبَلَغْنَ أَجَلَهُنَّ فَأَمْسِكُوهُنَّ بِمَعْرُوفٍ أَوْ سَرِّحُوهُنَّ بِمَعْرُوفٍ﴾ ئەگەر ژنەکانتان تەڵاق داو ماوەی چاوەنۆڕیەکەیان بڕایەوە، یان بە شێوەیە خوا پەسەند ڕایانگرن، یان بەرانبەر بە یاسای ئاین ئازادیان بکەن. ئەمە فەرمانێکە لەلایەن خودای مەزنەوە بۆ ئەو پیاوان، ئەگەر یەکێکیان ژنەکەی تەڵاق داو دەیتوانی ئەو ژنە بگێڕێتەوە بۆ لای خۆی، با بە چاکی مامەڵەی لەگەڵدا بکات، ئەگەر عیددەکەی بەرەو تەواو بوون دەچوو هەر ئەوەندەی مابوو کە بتوانێ بیگێڕێتەوە، ئەگەر ژنەکەی هێنایەوە بۆ لای خۆی با خواپەسەندانە هەڵس‌و کەوتی لەگەڵا بکات‌و شایەتی هەبێت لە کاتی هێنانەوەیداو بڕیار بدا بە چاکی لەگەڵی ژیان بەسەر بەرێت. یان دەستی لێ هەڵگرێ واتە: وازی لێ بێنێ هەتا عیددەکەی تەواو دەبێ لە ماڵی خۆی وەدەری نێ بە شێوەیەکی باش، بەبێ کێشەو قاڵەقاڵ‌و قسە پێوتن. خودای گەورە ئەفەرموێت: ﴿وَلَا تُمْسِكُوهُنَّ ضِرَارًا لِّتَعْتَدُوا۟﴾ نەکات بە هیوای ئازاردانیان ڕایانگرن‌و لە هەق لادەن. ئیبنوعەبباس‌و موجاهیدو مەسروق‌و حەسەن‌و قەتادەو زەحاك‌و ڕەبیع‌و موقاتیلی کوڕی حەیان‌و کەسانی تریش وایان وتوە. پیاو ژنەکەی تەڵاق ئەدا، کاتێ کە نزیکی تەواو بوونی عیددەکەی دەهات بۆ زیان پێگەیاندنی دەیگێڕایەوە بۆ لای خۆی، بۆ ئەوە ئەو ژنە نەچێ شوو بکات بە یەکێکی تر. دیسان تەڵاقی ئەدایەوەو دەکەوتەوە عیددەوە، کاتێ عیددەکەی بەرەو تەواو بوون دەچوو، تەڵاقی ئەدا بۆ ئەوەی عیددەکەی لەسەر درێژ بکاتەوە، خودا ئەوەی لێ قەدەغە کردن[1] هەڕەشەی لێکردن‌و فەرمووی: ﴿وَمَن يَفْعَلْ ذَٰلِكَ فَقَدْ ظَلَمَ نَفْسَهُۥ﴾ هەرکەسێ وا ڕەفتار بکات ناهەقی لە خۆی کردوە، بەهۆی سەرپێچی فەرمانی خودای مەزنەوە. پاشان خودای گەورە ئەفەرموێت: ﴿وَلَا تَتَّخِذُوٓا۟ ءَايَٰتِ ٱللَّهِ هُزُوًا﴾ نیشانەکانی خودا بە کەم مەزانن. ئیبنوجەریر لەم ئایەتەدا ڕیوایەتی کردوە لە ئەبوموسای ئەشعەریەوە کە پێغەمبەری خودا(ﷺ)

---

[1] إبن أبي حاتم غ: (٢/٧٧٢-٧٧٤).

تووڕە بوو لە ئەشعەریەکان، ئەبو مووسا هات بۆ خزمەتیو دەڵێت: ئەی پێغەمبەری خودا(ﷺ) لە ئەشعەریەکان تووڕە بویت؟ فەرمووی: (کەسی واتان هەیە دەڵێ: تەلاقم داو گێڕامەوە، ئەمە تەلاقی موسوڵمانان نیە، ژن تەلاقی بدەن لە ماوەیەکی کەمی عیددەکەیدا)[1] مەسروق دەڵێت: ئەو کەسەی تەلاق ئەدا، تەلاق دانەکەی لە جێی خۆی نیە، زیان بە ژنەکەی دەگەیەنێ بە تەلاق دانیو بە گەڕانەوەیشی، بۆ ئەوەی عیددەکەی لەسەر درێژ بکاتەوە[2] حەسەنو قەتادەو عەتای خۆراسانیو ڕەبیعو موقاتیلی کوڕی حەیان وتیان: ئەو پیاوەیە کە ژنەکەی تەلاق ئەداو دەڵێت: گەمەم کرد یان ئازاد دەکات یان ژن مارە دەکات دەڵێت: گەمەم کرد، خودای مەزن ئەم ئایەتەی نارده خوارەوە کە ئەفەرموێت: ﴿وَلَا تَتَّخِذُوٓاْ ءَايَٰتِ ٱللَّهِ هُزُوٗا﴾ گاڵتە بە نیشانەکانی خودا مەکەن.[3] خودا فەرمانی دا کە پابەند بن بە بڕیارەکانیەوە. پاشان خودای مەزن ئەفەرموێت: ﴿وَٱذۡكُرُواْ نِعۡمَتَ ٱللَّهِ عَلَيۡكُمۡ﴾ با لە بیرتان بێ کە خودا چەندێ چاکەی لەگەڵ کردن. واتە: لە ڕەوانە کردنی پێغەمبەران بە چەند نیشانەی ڕوونو ئاشکراوە بۆتان. ﴿وَمَآ أَنزَلَ عَلَيۡكُم مِّنَ ٱلۡكِتَٰبِ وَٱلۡحِكۡمَةِ يَعِظُكُم بِهِۦ﴾ لە بیرتان بێ خودا ئەو کتێبەی بۆ ناردوون کە لەوێدا لە کارزانی سەر ڕاست دەبنو بەو ئامۆژگاریتان دەکا. واتە: بەو لە کارزانیە فەرمانتان پێدەکاو قەدەغەیشتان لێ دەکاو هەڕەشەشتان لێ دەکات ئەگەر سنوورەکان ببەزێنن. ﴿وَٱتَّقُواْ ٱللَّهَ وَٱعۡلَمُوٓاْ أَنَّ ٱللَّهَ بِكُلِّ شَيۡءٍ عَلِيمٞ﴾ دەبێ بترسن لە خوداو باش بزانن خودا هەموو شت دەزانێ. واتە: لە خوا بترسن لەوەی دەیکەنو لەویش وازی لێ دێنن. چونکە خودا هیچی لێ ون نابێ لەوەی دەیکەنو لەویش دەیشارنەوە بەو زوانە پاداشتتان ئەداتەوە لەسەری.

﴿وَإِذَا طَلَّقۡتُمُ ٱلنِّسَآءَ فَبَلَغۡنَ أَجَلَهُنَّ فَلَا تَعۡضُلُوهُنَّ أَن يَنكِحۡنَ أَزۡوَٰجَهُنَّ إِذَا تَرَٰضَوۡاْ بَيۡنَهُم بِٱلۡمَعۡرُوفِۗ ذَٰلِكَ يُوعَظُ بِهِۦ مَن كَانَ مِنكُمۡ يُؤۡمِنُ بِٱللَّهِ وَٱلۡيَوۡمِ ٱلۡأٓخِرِۗ ذَٰلِكُمۡ أَزۡكَىٰ لَكُمۡ وَأَطۡهَرُۚ وَٱللَّهُ يَعۡلَمُ وَأَنتُمۡ لَا تَعۡلَمُونَ ٢٣٢﴾

## ڕێگری لە بەرپرس(الوالي) کە ببێتە لەمپەری ئەو ژنە کە خۆی مارە بکاتەوە لەو پیاوەی کە تەلاقی داوە

خودای مەزن ئەفەرموێت: ﴿وَإِذَا طَلَّقۡتُمُ ٱلنِّسَآءَ فَبَلَغۡنَ أَجَلَهُنَّ فَلَا تَعۡضُلُوهُنَّ أَن يَنكِحۡنَ أَزۡوَٰجَهُنَّ إِذَا تَرَٰضَوۡاْ بَيۡنَهُم بِٱلۡمَعۡرُوفِ﴾ کاتێ ژنتان تەلاق داو عیددەکەی تەواو بوو، ئەگەر بە شێوەیەکی ڕوا لەگەڵ هاوجووتانی پێشویانا ڕێك کەوتن ئێوە مەبنە بەرهەڵستی شوو کردنیان. عەلی کوڕی ئەبوتەلحە دەڵێت:

---

[1] الطبري(٥/١٤).

[2] الطبري(٥/٨).

[3] إبن أبي حاتم غ: (٢/٧٧٥-٧٧٦).

له‌ ئیبنوعه‌بباسه‌وه‌ ده‌ڵێت: ئه‌م ئایه‌ته‌ هاته‌ خواره‌وه‌ له‌سه‌ر پیاوێ كه‌ ژنه‌كه‌ی ته‌ڵاقێ یان دوو ته‌ڵاق دابوو. خه‌ریك بوو عیدده‌كه‌ی ته‌واو ده‌بوو، پاشان وا دیار بوو ده‌یویست ژنه‌كه‌ی ماره‌ بكاته‌وه‌ یان بیگێڕێته‌وه‌ بۆ لای خۆی. ژنه‌كه‌یش هه‌ر حه‌زی ده‌كرد، به‌ڵام به‌رپرسه‌كانی ژنه‌كه‌ نه‌یان ده‌هێشت بچێته‌وه‌ لای مێرده‌كه‌ی، خودای مه‌زن قه‌ده‌غه‌ی كرد كه‌ ببنه‌ ڕێگری[1] هه‌ر به‌و جۆره‌ عه‌وفیش ڕیوایه‌تی كردوه‌ له‌ ئیبنوعه‌بباسه‌وه‌[2] مه‌سروق‌و ئیبراهیمی نه‌خه‌عی‌و زوهری‌و زه‌ححاكیش وتویانه‌ ئه‌م ئایه‌ته‌ له‌سه‌ر ئه‌وه‌ هاتۆته‌ خواره‌وه‌.[3] ئه‌مه‌ی ئه‌مانه‌ ده‌یڵێن ئایه‌ته‌كه‌یش هه‌ر ئه‌وه‌ ده‌گه‌یه‌نێ.

### ماره‌ بڕین ناكرێ بێ به‌رپرس( الوالي )

وه‌ به‌ڵگه‌یش هه‌یه‌ كه‌ ئافره‌ت ناتوانێ خۆی بدا به‌ شوو، به‌ڵكو ده‌بێ به‌رپرسێكی بیدات به‌ شوو، وه‌ك تیرمیزی‌و ئیبنوجه‌ریر له‌ ته‌فسیری ئه‌م ئایه‌ته‌دا وتویانه‌، وه‌ك له‌م فه‌رمووده‌دا هاتوه‌: (ئافره‌ت ئافره‌ت نادا به‌ شوو، ئافره‌ت خۆی خۆی ماره‌ نابڕێ، داوێن پیس(الزانية) ئه‌و ئافره‌ته‌یه‌ كه‌ خۆی، خۆی ماره‌ ده‌بڕێت)[4] وه‌ له‌ ئه‌سه‌رێكی(الاثر) ترا هاتوه‌: (ماره‌ بڕین ناكرێ به‌ به‌رپرسێكی ڕێنمایی كه‌رو دوو شایه‌تی دادگه‌ر نه‌بێ).

### هۆی هاتنه‌ خواره‌وه‌ی ئه‌م ئایه‌ته‌

ڕیوایه‌ت كراوه‌ كه‌ ئه‌م ئایه‌ته‌ له‌سه‌ر مه‌عقیل كوڕی یه‌سارو خوشكه‌كه‌ی هاتۆته‌ خواره‌وه‌ بوخاری ڕیوایه‌تی كردوه‌ له‌ كتێبه‌ سه‌حیحه‌كه‌یدا له‌ ته‌فسیری ئه‌م ئایه‌ته‌دا كه‌ خوشكی مه‌عقیل كوڕی یه‌سار مێرده‌كه‌ی ته‌ڵاقی دابوو، وازی لێ هێنا هه‌تا عیدده‌كه‌ی ته‌واو بوو، داوای كرده‌وه‌ مه‌عقیل نه‌یهێشت بیباته‌وه‌ ئه‌م ئایه‌ته‌ هاته‌ خواره‌وه‌: ﴿فَلَا تَعْضُلُوهُنَّ أَن يَنكِحْنَ أَزْوَاجَهُنَّ﴾ ئێوه‌ ڕێگریان مه‌كه‌ن كه‌ شوو بكه‌ن به‌ مێرده‌كانیان[5] هه‌ر به‌و جۆره‌ ئه‌بوداوودو تیرمیزی‌و ئیبنوماجه‌و ئیبنوئه‌بی حاته‌م‌و ئیبنوجه‌ریرو ئیبنومه‌رده‌وه‌یهی به‌ چه‌ندین ڕێگه‌ ڕیوایه‌تیان كردوه‌ له‌ حه‌سه‌نه‌وه‌، له‌ مه‌عقیلی كوڕی یساره‌وه‌[6] تیرمیزیش دیسان به‌ سه‌حیحی داناوه‌ له‌ مه‌عقیلی كوڕی یه‌ساره‌وه‌ ڕیوایه‌تی كردوه‌ كه‌ مێردی خوشكه‌كه‌ی پیاوێكی موسوڵمان بوو له‌ سه‌رده‌می پێغه‌مبه‌ری خوادا(ﷺ) ماوه‌یه‌ك هاوسه‌ری

---

[1] الطبري(٢٢/٥).
[2] الطبري(٢٢/٥).
[3] الطبري(٢٢/٥).
[4] إبن ماجة(٦٠٦/١)، پێشه‌كیه‌كه‌ی حه‌سه‌نه‌و دواییه‌كه‌ی مه‌وقوفه‌.
[5] فتح الباري(٤٠/٨).
[6] أبوداود(٥٦٩/٢)، تحفة الاحوذي(٣٢٥/٨)، إبن أبي حاتم غ: (٢/ ٧٧٨)، الطبري(١٧/٥-١٩)، البيهقي(١٠٤/٧)، سه‌حیحه‌.

بوو، پاشان تەلاقێکی داو نەیگێڕایەوە هەتا عیددەکەی تەواو بوو، ئەو حەزی لەو دەکردو ئەویش(ژنەکە) حەزی لەو دەکرد. پاشان لەگەڵ داواکاردا داوای کردەوە، مەعقیل دەڵێت: ئەی هیچوپوچ ڕێزم لێ گرتیو کردمە هاوسەرت، کەچی تۆ تەلاقت دا، سوێند بە خوا هەرگیز ناگەڕێتەوە بۆ لات ئیتر ئەمە دواین جارتە. دەڵێت: خودای مەزن دەیزانی کە ئەو پیاوە پێویستی بەو ژنەیەو ئەو ژنەیش پێویستی بەو پیاوەیە، ئەم ئایەتەی ناردە خوارەوە کە ئەفەرموێت: ﴿وَإِذَا طَلَّقْتُمُ ٱلنِّسَآءَ فَبَلَغْنَ أَجَلَهُنَّ﴾ کاتێ کە ژنانتان تەلاق داو کاتێ عیددەکەیان بەسەر چوو. هەتا دەگاتە ﴿وَأَنتُمْ لَا تَعْلَمُونَ﴾ ئێوە نایزانن. کاتێ کە مەعقیل ئەوەی بیست دەڵێت: گوێڕایەڵی پەروەردگارمو ملکەچم، پاشان بانگی کردو پێی وت: لێت مارە دەکەمو ڕێزیشت لێ دەگرم[1] ئیبنومەردەوەیهی ئەمەی بۆ زیاد کردوە، کەفارەتی سوێندەکەیشم دا[2] خودای مەزن ئەفەرموێت: ﴿ذَٰلِكَ يُوعَظُ بِهِۦ مَن كَانَ مِنكُمْ يُؤْمِنُ بِٱللَّهِ وَٱلْيَوْمِ ٱلْءَاخِرِ﴾ کێ لە ئێوە بڕوای بە خواو ڕۆژی قیامەت هەبێ ئەم ئامۆژگاریە پێك دێنێ. واتە: ئەمەی کە لێم قەدەغە کردن کە بەرپرسان ڕێگری نەکەن کە ئافرەتانیان شوو بکەن کاتێ کە ژنو مێرد بە یەکتری ڕازین پێکەوە چاك دەبن، ئەو کەسە بەم ئامۆژگاریە هەڵدەسێ کە بڕوای بە خوداو ڕۆژی قیامەت هەیە واتە: بڕوای بە پەیامی خودا هەیەو لە هەڕەشەو سزاو تۆڵەی خودا دەترسێ لە ڕۆژی دوایدا. ﴿ذَٰلِكُمْ أَزْكَىٰ لَكُمْ وَأَطْهَرُ﴾ ئەمە بە سوودی ئێوەیەو سوودیش بۆ پاکان هەیە. واتە: شوێن کەوتنی شەرعی خوداو گەڕاندنەوەی ژنان بۆ لای مێردەکانیانو واز هێنان لە دەمارگیری بۆ ئێوە چاکترو پڕ سوودترەو پاك تریشە بۆ دڵەکانتان ﴿وَٱللَّهُ يَعْلَمُ وَأَنتُمْ لَا تَعْلَمُونَ﴾ خودا دەیزانێو ئێوە سەری لەبەر دەرناکەن. واتە: خودا بەرژەوەندیەکان باشتر دەزانێ کاتێ کە فەرمانتان پێدەکا بە شتێ یان لێتان قەدەغە دەکا، ئێوە نازانن‌و سەر لەوە دەرناکەن کە دەیکەن‌و ئەویش دەبنە ڕێگری.

﴿وَٱلْوَٰلِدَٰتُ يُرْضِعْنَ أَوْلَٰدَهُنَّ حَوْلَيْنِ كَامِلَيْنِ ۖ لِمَنْ أَرَادَ أَن يُتِمَّ ٱلرَّضَاعَةَ ۚ وَعَلَى ٱلْمَوْلُودِ لَهُۥ رِزْقُهُنَّ وَكِسْوَتُهُنَّ بِٱلْمَعْرُوفِ ۚ لَا تُكَلَّفُ نَفْسٌ إِلَّا وُسْعَهَا ۚ لَا تُضَآرَّ وَٰلِدَةٌۢ بِوَلَدِهَا وَلَا مَوْلُودٌ لَّهُۥ بِوَلَدِهِۦ ۚ وَعَلَى ٱلْوَارِثِ مِثْلُ ذَٰلِكَ ۗ فَإِنْ أَرَادَا فِصَالًا عَن تَرَاضٍ مِّنْهُمَا وَتَشَاوُرٍ فَلَا جُنَاحَ عَلَيْهِمَا ۗ وَإِنْ أَرَدتُّمْ أَن تَسْتَرْضِعُوٓا۟ أَوْلَٰدَكُمْ فَلَا جُنَاحَ عَلَيْكُمْ إِذَا سَلَّمْتُم مَّآ ءَاتَيْتُم بِٱلْمَعْرُوفِ ۗ وَٱتَّقُوا۟ ٱللَّهَ وَٱعْلَمُوٓا۟ أَنَّ ٱللَّهَ بِمَا تَعْمَلُونَ بَصِيرٌ (٢٣٣)﴾

[1] تحفة الاحوذي(٨/٣٢٤)، سەحیحە.

[2] البيهقي(٧/١٠٤).

**شیردان دەبیّ لە ماوەی شیرداندا بیّت (واتە: هەتا دوو ساڵ)**

خودای مەزن ئەفەرمویّت: ﴿وَٱلْوَٰلِدَٰتُ يُرْضِعْنَ أَوْلَٰدَهُنَّ حَوْلَيْنِ كَامِلَيْنِ ۖ لِمَنْ أَرَادَ أَن يُتِمَّ ٱلرَّضَاعَةَ﴾ دایکان دەبیّ بە منداڵەکانیان دوو ساڵی تەواو شیر بدەن، بۆ کەسیّك کە بیەویّ بە تەواوی شیر بدا. ئەمە ڕیّنمایەکە لەلایەن خوداوە بۆ دایکان کە شیر ئەدەن بە منداڵەکانیان بە تەواوی کە دوو ساڵە، دوای ئەو دوو ساڵە کار بە شیردان ناکریّ، هەر بۆیە خودای مەزن ئەفەرمویّت: ﴿لِمَنْ أَرَادَ أَن يُتِمَّ ٱلرَّضَاعَةَ﴾ بۆ کەسیّك بیەویّ بە تەواوی شیر بدا. بە شیردان نابیّتە مەحرەم مەگین کەسیّ شیر پیّدانەکەی لە دوو ساڵ کەمتر بیّت، ئەگەر منداڵیّ شیری خوارد تەمەنی لە دوو ساڵ زیاتر بیّ نابیّتە مەحرەم. تیرمیزی دەڵیّت: لە بابی ئەوەی دەربارەی شیردان هاتوە نابیّتە مەحرەم مەگین لە منداڵیداو تەمەنی کەمتر بیّ لە دوو ساڵ پاشان ڕیوایەتی کردوە لە ئوموسەلەمەوە، دەڵیّت: پیّغەمبەری خودا(ﷺ) فەرموویەتی: (نابیّتە مەحرەم بە شیر پیّدان مەگین ئەو شیرە لە ماوەی شیر پیّدان بە ریخۆڵەدا تیّپەڕیبیّ لە پیّش بڕانەوەی ئەو منداڵە لە شیر)[1]، دەڵیّت ئەمە فەرموودەیەکی حەسەنی سەحیحە، کار بەمە کراوە لە لای زۆرینەی زانایان لە هاوەڵەکانی پیّغەمبەری خوداو(ﷺ) زانایانی تریش، کە بە شیر خواردن(منداڵ) نابیّتە مەحرەم مەگین لە دوو ساڵ کەمتر بیّت، ئەوەی دوو ساڵی تەواو کرد(بە شیر خواردن) نابیّتە مەحرەم. منیش دەڵیّم: تەنیا تیرمیزی ئەم فەرموودەی ڕیوایەت کردوە، پیاوەکانی لەسەر مەرجی بوخاریو موسلیم. مانەی ئەوە کە فەرموویەتی: ((إلا ماكان في الثدي) واتە: لە شویّن شیر پیّدا نابیّت پیّش دوو ساڵ)، وەك لەم فەرموودەدا هاتوە کە ئیمامی ئەحمەد ڕیوایەتی کردوە لە بەرائی کوڕی عازیبەوە، دەڵیّت: کاتیّ ئیبراهیمی کوڕی پیّغەمبەر(ﷺ) کۆچی دوایی کرد فەرمووی: (کوڕی من مردوە لە شویّنی شیرداندا بووە، لە بەهەشتا دەیەنیّکی(شیر پیّ دەریّکی) دەبیّ)[2] ئەوەی دارولقوتنی(الدار القطني) ڕیوایەتی کردوە پشتگیری لیّدەکا لە ئیبنوعەبباسەوە، دەڵیّت: پیّغەمبەری خودا(ﷺ) فەرموویەتی: (نابیّتە مەحرەم بە شیر پیّدان مەگەر ئەوە لە دوو ساڵیدا بوبیّ).[3] منیش دەڵیّم: ئیمامی مالیك ڕیوایەتی کردوە لە موتأدا(الموطأ) لە سەوری(ثور) کوڕی زەیدەوە، لە ئیبنوعەبباسەوە بە مەرفوعی[4] دراوەردی(الدراوردي) ڕیوایەتی کردوە

---

[1] تحفة الاحوذي(٣١٣)، فەرموودەیەکی باشە(جید).

[2] محمدة التفسیر(١/١٢٦)، سەحیحە.

[3] الدار القطني(٤/١٧٤)، فەرموودەیەکی مەوقوفە.

[4] الموطأ(٢/٦٠٢).

لە سەورەوە(ثور) لە عیکرمەوە لە ئیبنوعەبباسەوە، ئەمەی بۆ زیاد کردوە(ئەوەی دوای دوو ساڵ هیچ شتی نیە) واتە: نابێتە مەحرەم بە شیرپێدان. ئەمە ڕاسترە.

**شیردان بە گەورە**

لە فەرموودەی سەحیحا هاتوە لە عائیشەوە(ڕەزای خوای لێ بێ) کە بەلای ئەوە شیردان بە گەورە کار دەکاتە سەر مەحرەم بوونی.[1] ئەمە قسەی عەتای کوڕی ڕباح‌و لەیسی(الليث) کوڕی سەعدە، کە عائیشە فرمانی دا بەوانەی کە هەڵی بژاردن کە بچنە ژورەوە بۆ لای لە پیاوان بۆلای هەندێ لە ئافرەتانێ کە شیریان پێدەدەن، فەرموودەکەی سالمی کوڕی ئەبوحوزەیفەی کردوە بەڵگە، لەو کاتەدا پێغەمبەر(ﷺ) فەرمانی دابوو بە ژنەکەی ئەبوحوزەیفە کە شیری پێبدات، تەمەنی گەورە بوو، بەو شیرپێدانە دەچووە ژوورەوە بۆلای. بەڵام خێزانەکانی تری پێغەمبەر(ﷺ) بووە ڕازی نەبوون. ئەو شیر پێدانەیان بە شتێکی تایبەتی دادەنا.[2] ئەمە ڕای کۆی زانایانیشە(الجمهور).

**کرێی شیر پێدان**

خودای مەزن ئەفەرموێت: ﴿وَعَلَى الْمَوْلُودِ لَهُ رِزْقُهُنَّ وَكِسْوَتُهُنَّ بِالْمَعْرُوفِ ۚ لَا تُكَلَّفُ نَفْسٌ إِلَّا وُسْعَهَا﴾ لەو ماوەیەدا جل‌و بەرگ‌و بژێوی دایکەکە(لەسەر دابی موسوڵمانانی ئەو شوێنە) لەسەر باوکە، کەسیش لە توانا بەدەری لەسەر نیە. واتە: باوکی منداڵەکە بە پێی نەریتی ئەو شوێنە جل‌و بەرگ‌و بژێوی دایکەکەی لەسەرە بەبێ ڕژدی‌و دەست بڵاوی‌و بەپێی توانای ئەو پیاوە خۆی وەك خودای مەزن ئەفەرموێت: ﴿لِيُنفِقْ ذُو سَعَةٍ مِّن سَعَتِهِ ۖ وَمَن قُدِرَ عَلَيْهِ رِزْقُهُ فَلْيُنفِقْ مِمَّا آتَاهُ اللَّهُ ۚ لَا يُكَلِّفُ اللَّهُ نَفْسًا إِلَّا مَا آتَاهَا ۚ سَيَجْعَلُ اللَّهُ بَعْدَ عُسْرٍ يُسْرًا﴾[3] کێ خاوەن دارایيە، لە دارایی خۆی خەرج بکات‌و کێش بژێوی کەمی هەیە، لەوەندەی خودا پێداوە خەرجی بکا، خودا ئەرك ناخاتە سەر کەس، مەگین لەوەندەی پێداوە، خودا زوو لە پاش تەنگانە فەرمانی دێنێ. زەححاك دەڵێت: ئەگەر ژنەکەی تەڵاق داو منداڵی لێی هەبوو، کە دایکەکە شیری دا بە منداڵەکەی دەبێ باوکەکە بەپێی نەریتی ئەو ناوچەیە جل‌و بەرگ‌و بژێوی دایکەکە بدات[4].

---

[1] مسلم(٢/١٠٧٧).

[2] أبوداود(٢/٥٤٩–٥٥٠).

[3] الطلاق(٧).

[4] الطبري(٥/٣٩).

## زیان نەگەیاندن و نەبونە هۆکاری زیان گەیاندن

خودای مەزن ئەفەرموێت: ﴿لَا تُضَآرَّ وَٰلِدَةُۢ بِوَلَدِهَا وَلَا مَوۡلُودٞ لَّهُۥ بِوَلَدِهِۦ﴾ هیچ دایكو بابێ نابێ لەبەر منداڵەکەیان زیان بە یەکتر بگەیەنن. واتە: دایکەکە منداڵەکە بداتەوە بەسەر باوکەکەیدا بۆ ئەوەی لە پەروەردەکردنیا تووشی زیانی بکات، بەڵکو بۆی نیە بیداتەوە بەسەریدا دوای ئەوە کە بوری، هەتا گۆشی دەکا، چونکە منداڵ بە زۆری ئەگەر بە شیری دایکی گۆش نەکرێ ناژێ. دوای گۆش کردنی دایکەکە بۆی هەیە بیداتەوە بەسەر باوکەکەیدا ئەگەر ویستی: بەڵام ئەگەر زیانی گەیاند بە باوکەکەی ڕوا نیە شتی وا بکا. وەك چۆن باوکەکە بۆی نیە منداڵەکە لە دایکی وەربگرێتەوە بۆ ئەوەی تووشی زیانی بکا. بۆیە خودای مەزن ئەفەرموێت: ﴿وَلَا مَوۡلُودٞ لَّهُۥ بِوَلَدِهِۦ﴾ وە زیان نەگەیەنرێ بە هیچ باوکێك بەهۆی منداڵەکەیەوە. ئەمە قسەی موجاهیدو قەتادەو زەحهاكو زوهریو سوودیو سەوریو ئیبنوزەیدو کەسانی تریشە[1] ﴿وَعَلَى ٱلۡوَارِثِ مِثۡلُ ذَٰلِكَ﴾ ئەگەر منداڵ بابی نەبوو، میراتگران لە سەریانە جلوبەرگو بژێوی دایکەکە بدەن. وتراوە: بۆ ئەوە کە تووشی زیان نەبێ. ئەمە قسەی موجاهیدو شەعبیو زەحهاکە. جمهوریش هەر وایان وتوە ئیبنوجەریریش لە تەفسیرەکەیدا لەسەر ڕای جمهورە کە دەڵێن: لەسەر میراتگرانە جلوبەرگو بژێوی دایکەکە بدەن لەبەر منداڵەکەو هەڵسن بەو مافە وەك باوکەکەی، ئیبنوجەریر باسی کردوەو وتویەتی شیردان دوای دوو ساڵ بە منداڵ لەوانەیە زیانی هەبێ بۆ جەستەو ئاوەزی منداڵەکە. سوفیانی سەوری دەڵێت: لە ئەعمەشەوە لە ئیبراهیمەوە، لە عەلقەمەوە: کەژنێکی دی دوای دووساڵ شیری ئەدا بەمنداڵەکەی، پێی وت: شیری پێمەدە[2].

### لە شیر بڕینەی( منداڵ ) لەسەر ڕەزامەندی هەردوولا

خودای مەزن ئەفەرموێت: ﴿فَإِنۡ أَرَادَا فِصَالًا عَن تَرَاضٖ مِّنۡهُمَا وَتَشَاوُرٖ فَلَا جُنَاحَ عَلَيۡهِمَا﴾ جا ئەگەر دایك و باب بەخۆشی و بە ڕاوێژ، ویستیان(زووتر) منداڵ لە شیر ببڕنەوە هیچ گوناهێکیان نایەتە سەر. واتە: ئەگەر دایك و بابی منداڵەکە ویستیان لە شیر بیبڕنەوە لە پێش دوو ساڵ، ئەوەیان بە چاك زانی بۆ منداڵەکە و ڕاوێژیان لە سەر کرد و ڕێکەوتن لە سەری. گوناهیان ناگات. دیارە لە مەوە دەردەکەوێ کە ڕەزامەندی یەکێکیان بەس نیە، بۆ هیچ کەسێکیان ڕەوا نیە ڕای خۆی فەرز بکات بەبێ ڕاوێژ کردن لەگەڵ ئەوی تردا، ئەمە قسەی سەوری و کەسانی تریشە. چونکە ئەمە گرنگی دانێکە بە سەرپەرشتی کردنی منداڵەکەو بەزەیی خودای گەورەیە بە عەبدەکانی کە مەرجی داناوە لەسەر باوكو دایك لەسەر پەروەردەکردنی منداڵەکانیانو ڕێنمایی کردوون بۆ شتێ کە بەرژەوەندی خۆیانو منداڵەکانیانی

---

[1] الطبري(٥/٤٠-٥٠).

[2] الطبري(٥/٣٦).

تێدایە. وەك خودای مەزن لە سورەتی تەلاقدا ئەفەرموێت: ﴿فَإِنْ أَرْضَعْنَ لَكُمْ فَآتُوهُنَّ أُجُورَهُنَّ وَأْتَمِرُوا بَيْنَكُم بِمَعْرُوفٍ وَإِن تَعَاسَرْتُمْ فَسَتُرْضِعُ لَهُ أُخْرَىٰ﴾[1] ئەوسا ئەگەر شیریان دا بە منداڵەکەتان ئێوەیش کرێیان بدەنێ، وە لە نێوان خۆتاندا ڕاوێژ بکەن بە چاکی(لە بارەی منداڵەکەوە) ئەگەر ڕێك نەکەوتن ئەوە با ئافرەتێکی تر شیری بداتێ. پاشان خودای مەزن لێرەدا ئەفەرموێت: ﴿وَإِنْ أَرَدتُّمْ أَن تَسْتَرْضِعُوا أَوْلَادَكُمْ فَلَا جُنَاحَ عَلَيْكُمْ إِذَا سَلَّمْتُم مَّا آتَيْتُم بِالْمَعْرُوفِ﴾ خۆ ئەگەر ویستتان کەسێکی تر شیر بداتە منداڵانتان(بەو مەرجە بەپێی دابو نەریتی ڕۆژ کرێی تەواوی بدەنێ) هیچ گوناهتان نایەتە سەر. واتە: ئەگەر بابو دایکەکە هاتنە سەر ئەوە، باوکەکە منداڵەکە وەرگرێتەوە لەبەر هۆکارێ لەلایەن دایکەکەوە یان باوکەکەوە، دایکەکە هیچ گوناهی ناگا بیگێڕێتەوە باوکەکەیش دیسان گوناهی ناگا لێی وەرگرێ. ئەگەر کرێی ئەو ماوەی پێشوەی بە تەواوی و ڕێكو پێکی بداتێو کەسێکی تر بگرێ بە کرێ شیر بدا بە منداڵەکەی بەپێی دابو نەریتی ڕۆژ. ئەمە قسەی زۆر لە زانایانە. ﴿وَاتَّقُوا اللَّهَ وَاعْلَمُوا أَنَّ اللَّهَ بِمَا تَعْمَلُونَ بَصِيرٌ﴾ دەبێ لە خودایش ترستان هەبێ، ئەوەنەیش دەبێ بزانن، هەر کارێ ئێوە دەیکەن خودا دەیبینێ. هیچی لێ ون نابێو ناشارێتەوە لە قسەو هەڵسو کەوتتان.

﴿وَالَّذِينَ يُتَوَفَّوْنَ مِنكُمْ وَيَذَرُونَ أَزْوَاجًا يَتَرَبَّصْنَ بِأَنفُسِهِنَّ أَرْبَعَةَ أَشْهُرٍ وَعَشْرًا ۖ فَإِذَا بَلَغْنَ أَجَلَهُنَّ فَلَا جُنَاحَ عَلَيْكُمْ فِيمَا فَعَلْنَ فِي أَنفُسِهِنَّ بِالْمَعْرُوفِ ۗ وَاللَّهُ بِمَا تَعْمَلُونَ خَبِيرٌ (٢٣٤)﴾

**عیددەی ئەو ژنانەی مێردیان دەمرێت**

خودای مەزن ئەفەرموێت: ﴿وَالَّذِينَ يُتَوَفَّوْنَ مِنكُمْ وَيَذَرُونَ أَزْوَاجًا يَتَرَبَّصْنَ بِأَنفُسِهِنَّ أَرْبَعَةَ أَشْهُرٍ وَعَشْرًا﴾ ئەوانەی لێتان دەمرنو ژنانیان لێ بەجێ دەمێنێ، ژنەکانتان هەتا چوار مانگو دە ڕۆژ چاوەنۆڕ بن. ئەمە فەرمانێکە لەلایەن خوداوە بۆ ئەو ژنانەی کە مێردیان دەمرێ، دەبێ چوار مانگو دە ڕۆژ چاوەنواڕ بن. ئەمە بڕیارە ئەو ژنانە دەگرێتەوە کە مێردیان چووەتە لایانو ئەوانەیش دەگرێتەوە کە نەچوونەتە لایانو سەرجێییان لەگەڵا نەکراوە بەڵگەیش لەسەر ئەوە، ئەوانەیش سەرجێییان لەگەڵا نەکراوە دەگرێتەوە ئەم ئایەتە پیرۆزەیە، وە ئەم فەرموودەی ئیمامی ئەحمەدو خاوەنی سونەنەکانی تریشەو تیرمیزی بە سەحیحی داناوە: کە ئیبنومەسعود. پرسیاری لێ کرا دەربارەی ژنێکی مارە کردو پاشان مردو سەرجێیی لەگەڵا نەکردووەو مارەیشی بۆ دانەناوە، چەند جار هاتنە لای بۆ ئەوە.، ئیبنومەسعود دەڵێت: دەربارەی ئەوە بە ڕای خۆم قسە دەکەم، ئەگەر پێکام

---

[1] الطلاق(٦).

ئەوە لە خوداوەیە، ئەگەر هەڵەیشم کرد ئەوە لە خۆمو لە شەیتانەوەیە، خوداو پێغەمبەری خودا(ﷺ) پاكو بێگەردن دوورن لێیەوە: مارەیی تەواوی بۆ هەیەو، وە لە وتەیەکی تر: مارەیی هاوشێوەی خۆی هەیە. نابێ تووشی زیان ببێو غەدری لێ بکرێ. عیددەی لەسەرە تەواوی بکاتو میراتیش وەردەگرێ. مەعقیلی کوڕی سینانی ئەشجەعی هەڵساو دەڵێت: گوێم لە پێغەمبەری خودا بوە(ﷺ) کە وا بڕیاری داوە دەربارەی بەروەعی(بَرْوَع) کچی واشیق، عەبدوڵڵا زۆر دڵخۆش بوو بەوە. وە لە ڕیوایەتێکی ترا هاتوە: چەند پیاوێ لە ئەشجەعیەکان هەڵسانو وتیان: شایەتی ئەدەین کە پێغەمبەری خودا(ﷺ) وا بڕیاری داوە دەربارەی بەروەعی(بَرْوَع) کچی واشیقەوە[1] لەمە دەرناچێ مەگین ژنێ مێردەکەی مردبێو زکی پڕ بێ، عیددەکەی بە دانانی زکەکەیەتی با بە ماوەی چەند چرکەیەکیش بێ دوای مردنی، بەپێی ئەم ئایەتە کە خودای گەورە ئەفەرموێت: ﴿وَأُوْلَٰتُ ٱلۡأَحۡمَالِ أَجَلُهُنَّ أَن يَضَعۡنَ حَمۡلَهُنَّۚ﴾[2] ئەوانەش کە سکیان هەیە ماوەی چاوەنۆڕیەکەیان دانانی سکەکەیانە. وەك لە فەرموودەدا هاتوە لە سوبەیعەی(سُبيعة) ئەسلەمیەوە کە لە هەردوو سەحیحەکەدا هاتوە بە جۆرێکی تر. کە مێردەکەی سەعیدی کوڕی خەولە مرد ئەو سکی پڕ بوو، ئەوەندەی پێ نەچوو دوای مردنی سکەکەی دانا، لە ڕیوایەتێکی ترا هاتوە، دوای چەند ڕۆژێك کاتێ کە خوێنی منداڵ بوونی تەواو بوو، خۆی پاكو خاوێنو جوان کرد بوو بۆ داوا کردنی ئەبوسەنابیلی کوڕی بەعکەك(أبو السنابل بن بَعْكَك) پێی وت: چیتە دەوبینم خۆت ڕازاندۆتەوە لەوانەیە بتەوێ شوو بکەی؟ سوێند بە خوا شوو ناکەی هەتا چوار مانگو دە ڕۆژ بەسەرتا تێنەپەڕێت، سوبەیعە دەڵێت: کاتێ کە ئەوەی پێ وتم: جلەکانم کۆ کردەوەو هەر ئێوارەم لێهات چوومە لای پێغەمبەری خوداو لەوبارەیەوە پرسیارم لێکرد، فەتوای بۆ دام، کە من ئازادم دوای دانانی سکەکەم، فەرمانی پێدام ئەگەر بمەوێ شوو بکەم[3].

### حیکمەتی ئەو عیددەیە

سەعیدی کوڕی موسەییبو ئەبولعالیەو کەسانی تریش وتویانە: حیکمەت لە عیددەی دوای مردن بۆ چوار مانگو دە ڕۆژ ئەوەیە، هەڵدەگرێ زکی ئافرەت منداڵی تێدا بێ، ئەگەر ئەو ماوەیە چاوەنۆڕی کرا دەردەکەوێ منداڵ لە زکا ببێ یان نەبێ دوای ئەوە. وەك لە فەرموودەدا هاتوە لە هەردوو سەحیحەکەدا لە ئیبنومەسعودو کەسانی تریشەوە: (هەر یەکێ لە ئێوە لە ماوەی چل ڕۆژدا لە سکی دلیکیدا وەدی دێت، لە ماوەی چل ڕۆژدا دەبێتە پارچەیەك گۆشتو خوێن، پاش ماوەی چل ڕۆژیش

---

[1] أحمد(٣/٤٨٠)، أبوداود(٢/٥٨٨)، تحفة الاحوذي(٤/٢٩٩)، النسائي(٦/١٩٨)، إبن ماجة(١/٦٠٩)، سەحیحە.

[2] الطلاق(٤).

[3] فتح الباري(٩/٣٧٩)، مسلم(٢/١١٢٢).

دەبێتە پارچە گۆشتێك، پاش ئەوە خودای گەورە فریشتەیەك دەنێرێت ڕۆح دەكات بە بەریدا)[1] ئەمە سێ چل ڕۆژە كە دەكاتە چوار مانگو دە ڕۆژیش ئیحتیات دوای ئەوە، لەبەر ئەوە هەندێ مانگ كەم دەكاو پاشان دوای ڕۆح كردن بە بەردا دەجوڵێت والله أعلم.

## عیددەی كەنیزەیە كە گەورەكەی دەمرێت

ئا لێرەدا هەندێ دەڵێن عیددەی كەنیزە(أم الولد) هەر عیددەی ئافرەتێكی ئازادە، ئەمەی كە ئیمامی ئەحمەد ڕیوایەتی كردوە لە عەمری كوڕی عاسەوە پشتگیرییان لێ دەكات كە وتویەتی: سونەتی پێغەمبەرەكەمان لێ تێك مەدەن، عیددەی كەنیزەیە(أم الولد) كاتێ كە گەورەكەی مرد چوار مانگو دە ڕۆژە.[2] ئەبوداوودو ئیبنوماجەیش ڕیوایەتیان كردوە[3].

## ماتەمینی پێویستە لە ماوەی عیددەدا

خودای مەزن ئەفەرموێت: ﴿فَإِذَا بَلَغْنَ أَجَلَهُنَّ فَلَا جُنَاحَ عَلَيْكُمْ فِيمَا فَعَلْنَ فِي أَنفُسِهِنَّ بِالْمَعْرُوفِ ۗ وَاللَّهُ بِمَا تَعْمَلُونَ خَبِيرٌ﴾ لەوە بەولا خۆیان هەر كارێك دەكەن(هەر ئەوەندە ناڕەوا نەبێ) بلێن بیكەن، ئێوە تووشی گوناه نابن خودایش لە هەر كارێ دەیكەن ئاگادارە. لەم ئایەتەوە وەردەگیرێ، ئەوەی كە مێردی دەمرێ پێویستە ماتەمینی بگرێ(الاحداد) ماوەی عیددەكەی. وەك لە هەردوو سەحیحەكەدا هاتوە بە شێوەیەكی تر لە ئوموحەبیبەو زەینەبی كچی جەحشەوە دایكانی موسوڵمانان كە پێغەمبەری خودا(ﷺ) فەرموویەتی: (ڕوا نیە بۆ ئافرەتێك كە بڕوای بە خوداو بە ڕۆژی دوایی ببێ كە ماتەمینی لەسەر مردو بگرێ زیاتر لە سێ ڕۆژ، مەگین بۆ مێرد كە چوار مانگو دە ڕۆژە)[4] وە دیسان لە هەردوو سەحیحەكەدا هاتوە لە ئوموسەلەمەوە كە ئافرەتێك دەڵێت: ئەی پێغەمبەری خودا(ﷺ) كچەكەم مێردەكەی مردوەو تووشی چاوئێشە بووە ئایا چاوی بۆ بڕێژین؟ فەرمووی: (نەخێر) ئەمەی دوو جار یان سێ جار دووبارە كردەوە، پاشان فەرمووی: (بێگومان ماوەكەی چوار مانگو دە ڕۆژە، خۆ جاران یەكێ لە سەردەمی نەفامیدا لە ئێوە ساڵێك دەمایەوە)[5] زەینەبی كچی ئوموسەلەمە دەڵێت: ئەوسا ئەگەر ژنێ مێردەكەی بمردایە دەچووە ژنجێكی پیسو پۆخڵی بچووكەوەو خراپترین جلو بەرگی لەبەر دەكرد نە بۆن خۆشیو نە هیچی تری بەجێ نەدەهێنا هەتا ساڵێك، پاشان پشقەڵێكی ئەدایە دەسو فڕێی ئەدا، ئینجا گیاندارێكیان دەهێنا: گوێدرێژ یان مەڕ یان باڵندەیەك داوێنو گیانی خۆی

---

[1] فتح الباري(١٣/٤٤٩)، مسلم(٤/٢٠٣٦).

[2] أحمد(٤/٣٠٢)، أبوداود(٢/٣٧٠)، فەرموودەیەكی لاوازە.

[3] إبن ماجة(١/٦٧٣)، لاوازە.

[4] فتح الباري(٩/٣٩٤)، مسلم(٢/١١٢٣).

[5] مسلم(٢/١١٢٤).

پیاهەڵدەسووی بە زۆری ئەو شتەی کە خۆی پێ دەسڕی دەمرد. مەبەست لە ماتەمینی خۆ دوورخستنەوە بووە لە خۆ جوان کردن‌و بۆنی خۆش لە خۆدان‌و ئەوەی بەکاردەهێنرێ بۆ مێرد، ئەمە شتێکی پێویستە لە ماوەی عیددەی ئەو مردوەدا، ئەمە ئەم ماتەمینی گرتنە بۆ هەموو ژنێکە کە مێردیان دەمرێت. ئیتر ئەو ژنە منداڵە یان لە بێ نوێژی چوەتەوە. ئازادە کەنیزەیە موسوڵمانە خوانەناسە جیاوازی نیە وەك یەکن. بەپێی ئایەتەکە. ﴿فَإِذَا بَلَغْنَ أَجَلَهُنَّ﴾ کاتێ عیددەیان بەسەرچوو، وەك زەححاك‌و ڕەبیعی کوڕی ئەنەس دەڵێن: ﴿فَلَا جُنَاحَ عَلَيْكُمْ﴾ هیچ گوناهێکتان ناگا هەرچی دەکەن.[1] زوهری دەڵێت: کەس‌و کارەکەی دەتوانن بیاندەن بە شوو ﴿فِيمَا فَعَلْنَ﴾ لەوە بەولا هەر کارێ ئەو ژنانە دەیکەن(هەر ئەوەندە ناڕەوا نەبێ) بلێن بیکەن[2]. عەوفی دەڵێت لە ئیبنوعەبباسەوە: کاتێ ژنێ تەڵاق درا یان مێردەکەی مرد کە عیددەکەی تەواو بوو ئیتر هیچ گوناهێکی نیە کە خۆی برازێنێتەوەو خۆی دەرخاو ئامادە بکات بۆ هاوسەرگیری(هەر ئەوەندە شتی ناڕەوا نەکات)[3] ڕیوایەتیش کراوە لە موقاتیلی کوڕی حەیانەوە هەر بەو جۆرە[4] ئیبنوجورەیج دەڵێت لە موجاهیدەوە ﴿فَلَا جُنَاحَ عَلَيْكُمْ فِيمَا فَعَلْنَ فِيٓ أَنفُسِهِنَّ بِٱلْمَعْرُوفِ﴾ لەوە بەولا خۆیان هەر کارێ دەکەن(هەر ئەوەندە ناڕەوا نەبێ) بلێن بیکەن. ئێوە گوناهتان ناگا. واتە: ئەگەر هاوسەرگیریەکی حەڵاڵ‌و پاك‌و خاوێن بکەن[5] هەر بەو شێوەیەش ڕیوایەت کراوە لە حەسەن‌و زوهری‌و سوودی یەوە[6].

﴿وَلَا جُنَاحَ عَلَيْكُمْ فِيمَا عَرَّضْتُم بِهِۦ مِنْ خِطْبَةِ ٱلنِّسَآءِ أَوْ أَكْنَنتُمْ فِيٓ أَنفُسِكُمْ ۚ عَلِمَ ٱللَّهُ أَنَّكُمْ سَتَذْكُرُونَهُنَّ وَلَٰكِن لَّا تُوَاعِدُوهُنَّ سِرًّا إِلَّآ أَن تَقُولُوا۟ قَوْلًا مَّعْرُوفًا ۚ وَلَا تَعْزِمُوا۟ عُقْدَةَ ٱلنِّكَاحِ حَتَّىٰ يَبْلُغَ ٱلْكِتَٰبُ أَجَلَهُۥ ۚ وَٱعْلَمُوٓا۟ أَنَّ ٱللَّهَ يَعْلَمُ مَا فِيٓ أَنفُسِكُمْ فَٱحْذَرُوهُ ۚ وَٱعْلَمُوٓا۟ أَنَّ ٱللَّهَ غَفُورٌ حَلِيمٌ ﴿٢٣٥﴾﴾

---

[1] إبن أبي حاتم غ: (٨١٢/٢).

[2] إبن أبي حاتم غ: (٨١٣/٢).

[3] إبن أبي حاتم غ: (٨١٣/٢).

[4] إبن أبي حاتم غ: (٨١٢/٢).

[5] الطبري(٩٣/٥).

[6] إبن أبي حاتم غ: (٨١٤/٢).

**ڕەوایی ئارەزوی خواستنی ژنی مێرد مردوو لە کاتی عیددەداو قەدەغە کردنی مارە بڕینیان لە کاتی عیددەدا**

خودای مەزن ئەفەرموێت: ﴿وَلَا جُنَاحَ عَلَيْكُمْ فِيمَا عَرَّضْتُم بِهِۦ مِنْ خِطْبَةِ ٱلنِّسَآءِ﴾ هیچ گوناهتان ناگات حەز لە خواستنی ژنانی شوو مردوتان بکەن. ناڕاستەوخۆ پێیان بڵێن. لە ماوەی عیددەیاندا بێ دواندنو دەربڕین. سەوریو شوعبەو جەریرو کەسانی تریش وتیان لە مەنسورەوە لە موجاهیدەوە لە ئیبنوعەبباسەوە(التعريض) دەڵێت: ئەو کەسە بڵێ: من دەمەوێ ژن بێنم، وە من حەز دەکەم ژنێکی ئاواو ئاوا بێنم. بە شێوەیەکی ڕەواو پەسەند ئەو قسەیە بکا[1]. وە لە ڕیوایەتێکی ترا هاتوە: زۆر حەز دەکەم خوا ژنێکم بکات بە نسیب. ئا لەم جۆرە قسانە، نەك بچێو دوای بکا[2] بوخاریش ڕیوایەتی کردوە بە تەعلیقی لە ئیبنوعەبباسەوە لەم ئایەتەدا ﴿وَلَا جُنَاحَ عَلَيْكُمْ فِيمَا عَرَّضْتُم بِهِۦ مِنْ خِطْبَةِ ٱلنِّسَآءِ﴾ هیچ گوناهتان ناگات حەز لە خواستنی ژنانی شوو مردوو بکەنو ناڕاستەوخۆ پێیان بڵێن. دەڵێت: ئەو کەسە بڵێ: من دەمەوێ ژن بێنم. پێویستیم بە ژن هێنان هەیە، حەز دەکەم ژنێکی چاکم ببێ بە تووشەوە[3] موجاهیدو تاوسو عیکرمەو سەعیدی کوڕی جوبەیرو ئیبراهیمی نەخەعیو شەعبیو حەسەنو قەتادەو زوهریو یەزیدی کوڕی قوسەیتو(قُسيط) موقاتیلی کوڕی حەیانو قاسمی کوڕی موحەممەدیش هەر وایان وتوە.[4] زۆرێ لە زانایانیو سەلەف لە ئیمامەکان لە بارەی(التعريض) وە، وتویانە: دروستە بۆ ئەو ژنانەی کە مێردەکانیان حەز لە هاوسەرگیری بکەن بەڵام بێ دەربڕین بۆ خواستنی، وە ئەو ژنانەیش کە بە تەواوی تەڵاق دراون هەر دروستە. وەك پێغەمبەری خودا(ﷺ) فەرمووی بە فاتیمەی کچی قەیس کاتێ کە مێردەکەی عەمری کوڕی حەفس تەڵاقی سێهەمی دا، فەرمانی پێدا کە لە ماڵی ئیبنوئومی مەکتوم عیددەکەی تەواو بکا. پاشان فەرمووی پێی: کاتێ عیددەکەت تەواو بوو ئاگادارم بکە) کاتێ کە عیددەکەی تەواو بوو، ئوسامەی کوڕی زەید داوای کرد شووی پێکرد[5] بەڵام تەڵاق دراو جیاوازی نیە لە نێوان زانایاندا کە دروست نیە جگە لە هاوسەرەکەی خۆی داوای بکات نە بە ئاشکراو نە بە هێمایش(التعريض) والله أعلم. خودای مەزن ئەفەرموێت: ﴿أَوْ أَكْنَنتُمْ فِىٓ أَنفُسِكُمْ﴾ یان لە دڵی خۆتاندا بڕیار بدەن دەیانخوازن. دەرنەخەن. وەك خودای مەزن

---

[1] الطبري(٥/٩٥).

[2] الطبري(٥/٩٦).

[3] فتح الباري(٩/٨٤).

[4] إبن أبي حاتم غ: (٢/٨١٧/٧١٨).

[5] مسلم(٢/١١١٤).

ئەفەرموێت: ﴿وَرَبُّكَ يَعۡلَمُ مَا تُكِنُّ صُدُورُهُمۡ وَمَا يُعۡلِنُونَ﴾[١] هەر پەروەردگارت دەزانێ چیان لە دڵدا پەنا داوە چیش ئاشکرا دەکەن. وەك ئەم ئایەتەیش کە ئەفەرموێت: ﴿وَأَنَا۠ أَعۡلَمُ بِمَآ أَخۡفَيۡتُمۡ وَمَآ أَعۡلَنتُمۡ﴾[٢] وە من هەر شتێ دەشارنەوەو هەر شتێ ئاشکرا دەکەن لە خۆتان ئاگاردارترم. هەر بۆیە لێرەدا ئەفەرموێت: ﴿عَلِمَ ٱللَّهُ أَنَّكُمۡ سَتَذۡكُرُونَهُنَّ﴾ خودا دەزانێ باسیان هەر ئەدرکێنن، لە دڵی خۆتاندا خودا لەسەرتان نانوسێ. پاشان ئەفەرموێت: ﴿وَلَٰكِن لَّا تُوَاعِدُوهُنَّ سِرًّا﴾ بەلام بە نهێنی بەڵێنیان پێ مەدەن. پێی مەڵێ: من شەیدای تۆم‌و بەڵێنم پێدە کە شوو بە کەس نەکەی جگە لە من‌و لە شێوەی ئەم قسانە[٣] ریوایەت کراوە لە سەعیدی کوڕی جوبەیرو شەعبی‌و عیکرمەو ئەبوزوحاو زەححاك‌و زوهریەوە هەر بەو جۆرە.[٤] موجاهیدو سەوری وتیان بەڵێنی لێ وەرگرێ کە شوو بە کەسی تر نەکا جگە لەو.[٥](واتە نابێ شتی وا بکات). ﴿إِلَّآ أَن تَقُولُواْ قَوۡلًا مَّعۡرُوفًا﴾ مەگین لەوێش خواپەسەندانە بیاندوێنن. ئیبنوعەبباس‌و سەعیدی کوڕی جوبەیرو[٦] سوودی‌و سەوری‌و ئیبنوزەید وتیان: مەگین بە شێوەی ئیشارەت بۆ کرد(التعريض) وەك بڵێیت: زۆر شتی تۆ هەیە من پێی ڕازیم‌و ئەو جۆرە قسانە[٧]. موحەممەدی کوڕی سیرین دەڵێت: وتم بە عەبیدە، مانای ئەم دەقە چیە کە خودای گەورە ئەفەرموێت: ﴿إِلَّآ أَن تَقُولُواْ قَوۡلًا مَّعۡرُوفًا﴾ مەگین لەوێش خواپەسەندانە بیاندوێنن. دەڵێت: بڵێ بە بەرپرسەکەی(الوالي) مەیدە بە شوو هەتا ئاگادارم نەکەی[٨] ئیبنوئەبی حاتەمیش ڕیوایەتی کردوە.

خودای مەزن ئەفەرموێت: ﴿وَلَا تَعۡزِمُواْ عُقۡدَةَ ٱلنِّكَاحِ حَتَّىٰ يَبۡلُغَ ٱلۡكِتَٰبُ أَجَلَهُۥ﴾ تا ماوەکە تەواو دەبێ باسی مارە کردن مەکەن. واتە: هەتا عیددەکە تەواو دەبێ باسی مارەکردن مەکەن. ئیبنوعەبباس‌و موجاهیدو شەعبی‌و قەتادەو ڕەبیعی کوڕی ئەنەس‌و ئەبومالیك‌و زەیدی کوڕی ئەسلەم‌و موقاتیلی کوڕی حەیان‌و زوهری‌و عەتای خۆراسانی‌و سوودی‌و سەوری‌و زەححاك وتیان: ﴿حَتَّىٰ يَبۡلُغَ

---

[١] القصص(٦٩).
[٢] الممتحنة(١).
[٣] الطبري(٥/١٠٧).
[٤] إبن أبي حاتم غ: (٢/٨٢١).
[٥] الطبري(٥/١٠٩).
[٦] إبن أبي حاتم غ: (٢/٨٢٤).
[٧] الطبري(٥/١١٤).
[٨] إبن أبي حاتم غ: (٢/٨٢٦).

ٱلْكِتَٰبُ أَجَلَهُۥ﴾ واتە: باسی مارە بڕین مەکەن هەتا عیددەکەی بەسەر دەچێ.[1] زانایان کۆدەنگن لەسەر ئەوە کە مارە بڕین لە ماوەی عیددەدا دروست نیە ﴿وَٱعْلَمُوٓاْ أَنَّ ٱللَّهَ يَعْلَمُ مَا فِىٓ أَنفُسِكُمْ فَٱحْذَرُوهُ﴾ دەبێ ئەوەش بزانن خودا دەزانێ ئێوە چیتان لە دڵدایە لێی بترسن. خودای مەزن ئاگادری ئەدات بەوەی لەناو دڵاندایە دەربارەی ژنان‌و ڕێنمایی کردوون بۆ شاردنەوەی شتی چاک‌و دوور کەوتنەوە لە شتی خراپ، پاشانیش بێ هیوایان ناکا لە بەزەیی خۆی‌و لێبوردەیی‌و ئەفەرموێت: ﴿وَٱعْلَمُوٓاْ أَنَّ ٱللَّهَ غَفُورٌ حَلِيمٌ﴾ بزانن خودا لە گوناه دەبورێ‌و دلۆڤانە.

﴿لَّا جُنَاحَ عَلَيْكُمْ إِن طَلَّقْتُمُ ٱلنِّسَآءَ مَا لَمْ تَمَسُّوهُنَّ أَوْ تَفْرِضُواْ لَهُنَّ فَرِيضَةً ۚ وَمَتِّعُوهُنَّ عَلَى ٱلْمُوسِعِ قَدَرُهُۥ وَعَلَى ٱلْمُقْتِرِ قَدَرُهُۥ مَتَٰعًۢا بِٱلْمَعْرُوفِ ۖ حَقًّا عَلَى ٱلْمُحْسِنِينَ ﴿٢٣٦﴾﴾

### تەلاق دان لە پێش سەرجێیی کردن

خودای مەزن ئەفەرموێت: ﴿لَّا جُنَاحَ عَلَيْكُمْ إِن طَلَّقْتُمُ ٱلنِّسَآءَ مَا لَمْ تَمَسُّوهُنَّ أَوْ تَفْرِضُواْ لَهُنَّ فَرِيضَةً ۚ وَمَتِّعُوهُنَّ عَلَى ٱلْمُوسِعِ قَدَرُهُۥ وَعَلَى ٱلْمُقْتِرِ قَدَرُهُۥ مَتَٰعًۢا بِٱلْمَعْرُوفِ ۖ حَقًّا عَلَى ٱلْمُحْسِنِينَ﴾ ئەگەر ژنتان تەلاق ئەدەن، بەرلەوە سەرجێییان لەگەڵ بکەن، مارەییتان هێشتا بۆ دیاری نەکردوون، هیچیان ناکەوێ‌و ئێوە گوناهتان ناگا، بەڵام وا چاکە شتێکیان بدەنێ لەماڵی خۆتان. دەوڵەمەند بە ئەندازەی خۆی‌و هەژاریش بە ئەندازەی خۆی، وا چاکە بۆ چاکەکاران. خودای مەزن ڕێی داوە بە تەلاق دانی ژن دوای عەقدەکەو پێش چوونە لای. ئیبنوعەبباس‌و تاوس‌و ئیبراهیم‌و حەسەنی بەسری وتیان: (المس) واتە مارە بڕین[2] بەڵکو دروستە تەلاقی بدا پێش چوونە لایی‌و مارەیشی بداتێ. ئەگەر مارە بڕابوو، هەرچەندە ئەو تەلاق دانە دڵی ئەو ئافرەتە دەشکێنێ.

### قەرەبووی تەلاق دان

هەربۆیە خودای گەورە فەرمانی داوە بە قەرەبووکردنەوەی ئەو ژنە لەلایەن هاوسەرەکەیەوە بە شتێك بەپێی توانای ئەو پیاوە. دەوڵەمەند بەپێی توانای خۆی‌و هەژاریش بەپێی توانای خۆی، بوخاری ڕیوایەتی کردوە لە سەحیحەکەیدا لە سەهلی کوڕی سەعدو ئەبونوسەیدەوە هەردووکیان وتیان: پێغەمبەری خودا(ﷺ) ئومەیمەی(أُميمة) کچی شەرحەبیلی مارە کرد، کاتێ کە چووە ژوورەوە بۆ لای، دەستی بەرز کردەوە بۆ لای وەك ئەوەی(ئومەیمە) ئەوەی پێ ناخۆش بێ، پێغەمبەر(ﷺ)

---

[1] إبن أبي حاتم غ: (٢/٨٢٨-٨٢٩).

[2] إبن أبي حاتم غ: (٢/٨٣١).

فەرمانی دا بە ئەبوئوسەید کە بەڕێی بکاتو دوو پۆشاکی سپی تێکەڵاو بە شینی(ثوبين زارقين) پێ بدات.[1] واتە: بیگێڕێتەوە بۆ لای کەسو کاری.

﴿وَإِن طَلَّقْتُمُوهُنَّ مِن قَبْلِ أَن تَمَسُّوهُنَّ وَقَدْ فَرَضْتُمْ لَهُنَّ فَرِيضَةً فَنِصْفُ مَا فَرَضْتُمْ إِلَّآ أَن يَعْفُونَ أَوْ يَعْفُوَاْ ٱلَّذِى بِيَدِهِۦ عُقْدَةُ ٱلنِّكَاحِ ۚ وَأَن تَعْفُوٓاْ أَقْرَبُ لِلتَّقْوَىٰ ۚ وَلَا تَنسَوُاْ ٱلْفَضْلَ بَيْنَكُمْ ۚ إِنَّ ٱللَّهَ بِمَا تَعْمَلُونَ بَصِيرٌ ﴿٢٣٧﴾﴾

## ئافرەت نیوەی مارەیی دەکەوێ ئەگەر تەڵاق درا پێش چوونە لای

خودای مەزن ئەفەرموێت: ﴿وَإِن طَلَّقْتُمُوهُنَّ مِن قَبْلِ أَن تَمَسُّوهُنَّ وَقَدْ فَرَضْتُمْ لَهُنَّ فَرِيضَةً فَنِصْفُ مَا فَرَضْتُمْ﴾ خۆ ئەگەر مارەییەکەتان بڕیبۆوەو هێشتا لەگەڵیان نەخەوتبوون، تەڵاقتان دان، نیوەی مارەییان دەکەوێ، ئەم ئایەتە پیرۆزە باسی قەرەبووەبوویش دەکات، وەك ئایەتی پێشوو باسی کرد، چونکە ئەم ئایەتە نیوەی ئەو مارەییەی داناوە کە فەرز کراوە، کاتێ مێرد ئەو ژنەی تەڵاق دا پێش ئەوەی بچێتە لای. خۆ ئەگەر قەرەبوویەکی تریش هەبوایە هەر باسی دەکرد، دەبیەست بەو ئایەتەی پێشەوە کە باسی قەرەبووی کردوە، والله أعلم. دابەش کردنی مارەیی بەم جۆرە کە باسی دەکەین ئەمە کارێکە زانایان کۆ دەنگن لەسەری‌و هیچ ناکۆکیەکیان لەسەری نیە، بۆیە کەی هەر کە مارەیی بۆ دانراو پاشان تەڵاقی دا پێش ئەوەی بچێتە لای، نیوەی مارەیی لەسەر ئەوە بۆ دادەنرێ کە لەسەری مارە براوە. ﴿إِلَّآ أَن يَعْفُونَ﴾ مەگین ئەو ژنانە خۆیان پێیان ببەخشن لەو مارەییەی کە بۆی دانراوە لە نیوەیە، ئەو ژنە هیچ شتێکی لەسەر واجب نیە، سوودی دەڵێت لە ئەبوسالحەوە لە ئیبنوعەبباسەوە لەم دەقەدا کە خودای مەزن ئەفەرموێت: ﴿إِلَّآ أَن يَعْفُونَ﴾ مەگینْ خیان پێیان ببەخشن، دەڵێت: مەگین بێوەژن(الثيب) خۆی ببەخشێ‌و دەس لە هەقی خۆی هەڵگرێ[2] ئیبنوئەبی حاتەم دەڵێت: ڕیوایەتیش کراوە لە شورەیح‌و سەعیدی کوڕی موسەییب‌و عیکرمەو موجاهیدو شەعبی‌و حەسەن‌و نافیع‌و قەتادەو جابیری کوڕی زەیدو عەتای خۆراسانی‌و زەححاك‌و زوهری‌و موقاتیلی کوڕی حەیان‌و ئیبنوسیرین‌و ڕەبیعی کوڕی ئەنەس‌و سوودی‌و هەر بەو جۆرە.[3] پاشان خودای گەورە ئەفەرموێت: ﴿أَوْ يَعْفُوَاْ ٱلَّذِى بِيَدِهِۦ عُقْدَةُ ٱلنِّكَاحِ﴾ یان ئەو کەسە پێیان ببەخشێ کە مارەبڕین بە دەست ئەوە. ئیبنوئەبی حاتەم دەڵێت: عەمری کوڕی شوعەیب ڕیوایەتی کردوە لە باوکیەوە لە

---

[1] فتح الباري(٩/٢٦٩).

[2] إبن أبي حاتم غ: (٢/٨٣٩).

[3] إبن أبي حاتم غ: (٢/٨٤٠-٨٤٢).

باپیریەوە لە پێغەمبەری خوداوە(ﷺ) فەرموویەتی: (ئەوەی مارەیی بە دەستە مێردە)[1] مەردەوەیهی هەروا دەڵێ‌و ئیبنوجەریریش هەر ئەم ڕایەی هەڵبژاردوە، ئەسڵی قسەکە ئەوەیە، ئەو کەسەی لە ڕاستیدا مارەیی بەدەستە مێردە. بێگومان ئەو دەتوانێ مارە ببڕێ‌و هەڵیشی وەشێنێتەوە، هەر چۆنێ دروست نیە وەلی هیچ لە ماڵی غەیرەز خۆی ببەخشێ، هەر بەو شێوەیە ناتوانێ مارەیی ببەخشێ.

﴿وَأَن تَعۡفُوٓاْ أَقۡرَبُ لِلتَّقۡوَىٰ﴾ پێ بەخشین لە ئاکاری پارێزگاری نزیکترە. ئیبنوجەریر دەڵێت: هەندێ وتویانە: ئەم وتارە ڕووی لە پیاوان‌و ژنانیش کردوە[2] ئیبنوعەبباس دەڵێت: ﴿وَأَن تَعۡفُوٓاْ أَقۡرَبُ لِلتَّقۡوَىٰ﴾ ئەوەیان دەبەخشێ نزیکترینیانە لە خۆپارێزیەوە[3]. هەر بەوجۆرە ڕیوایەت کراوە لە شەعبیی کەسانی تریشەوە. موجاهیدو نەخەعی و زەححاك‌و موقاتیلی کوڕی حەیان‌و ڕەبیعی کوڕی ئەنەس‌و سەوری وتیان: (الفضل) لێرەدا ژنەکە لە بەشێکی خۆش ببێ، یان پیاوەکە بە تەواوی مارەییەکە بدات بە ژنەکە[4] هەر بۆیە خودای گەورە ئەفەرموێت: ﴿وَلَا تَنسَوُاْ ٱلۡفَضۡلَ بَيۡنَكُمۡ﴾ لەبیر مەکەن چاکە لەگەڵ یەکتر بکەن. سەعید دەڵێت: واتە: چاکەکردن[5] ﴿إِنَّ ٱللَّهَ بِمَا تَعۡمَلُونَ بَصِيرٌ﴾ خودا لە هەر کارێ دەیکەن چاودێرە. واتە: هیچی لێ ناشارێتەوە لەو شتانەی کە دەیکەن، هەرکەسەو بەپێی کرداری بەو زوانە پاداشتی ئەداتەوە.

﴿حَٰفِظُواْ عَلَى ٱلصَّلَوَٰتِ وَٱلصَّلَوٰةِ ٱلۡوُسۡطَىٰ وَقُومُواْ لِلَّهِ قَٰنِتِينَ ﴿٢٣٨﴾ فَإِنۡ خِفۡتُمۡ فَرِجَالًا أَوۡ رُكۡبَانٗاۖ فَإِذَآ أَمِنتُمۡ فَٱذۡكُرُواْ ٱللَّهَ كَمَا عَلَّمَكُم مَّا لَمۡ تَكُونُواْ تَعۡلَمُونَ ﴿٢٣٩﴾﴾

خودای مەزن ئەفەرموێت: ﴿حَٰفِظُواْ عَلَى ٱلصَّلَوَٰتِ وَٱلصَّلَوٰةِ ٱلۡوُسۡطَىٰ﴾ لە نوێژەکان بەتایبەتی ئەو نوێژەی لە ناوەڕاستدایە ئاگادار بن. خودای گەورە فەرمان دەکات بە پارێزگاری لە نوێژەکان لە کاتی خۆیانداو پارازتنی سنوورەکانی‌و بەجێ هێنانی لە کاتی خۆیدا، وەك لە هەردوو سەحیحەکەدا هاتوە لە ئیبنومەسعودەوە دەڵێت: پرسیارم کرد لە پێغەمبەری خودا(ﷺ) کام کار زۆر چاکترە؟ فەرمووی: (نوێژ لە کاتی خۆیدا) وتم پاشان چی؟ فەرمووی: (جیهاد لە ڕێی خوادا) وتم: پاشان چی؟

---

[1] إبن أبي حاتم غ: (٢/٨٤٢).

[2] الطبري(٥/١٦٢).

[3] الطبري(٥/١٦٢).

[4] الطبري(٥/١٦٥-١٦٦).

[5] الطبري(٥/١٦٦).

فەرمووی: (چاکەکردن لەگەڵ باوك و دایك) دەڵێت: پێغەمبەری خودا(ﷺ) ئەوانەی بۆ باس کردم ئەگەر پرسیاری زیادتریشم بکردایە هەر وەڵامی ئەدامەوە[1].

## نوێژی ناوەڕاست

خودای مەزن لە نێوان نوێژەکاندا نوێژی ناوەڕاستی تایەبەت مەند کردوە کە نوێژی عەسرە. تیرمیزیو بەغەوی(ڕەحمەتی خوایان لێ بێ) وتیان: ئەمە قسەی زۆرینەی زانایانە کە(الصلوة الوسطی) نوێژی عەسرە، قازی ماوەردیش دەڵێت: ئەمە قسەی زۆرینەی زانایانی پێشینەیشە. حافیز ئەبوعومەر عەبدولبیر(عبدالبر) دەڵێت: ئەمە قسەی ئەهلی ئەسەریشە(الاثر) موحەممەدی کوڕی عەتیە لە تەفسیرەکەیدا دەڵێت: ئەمە قسەی جمهوری خەڵکە، حافیز ئەبوموحەممەد عەبدولمئمینی کوڕی خەلەفی دیماتی(الدمیاطي) لە کتێبەکەیدا بە ناوی(کشف المغطی في تبیین الصلوة الوسطی) دەڵێت: نوێژی عەسرە، گێڕاویەتیەوە لە عومەرو عەلیو ئیبنومەسعودو ئەبوئەیوبو عەبدوڵڵای کوڕی عەمرو سەموردی کوڕی جەندەبو ئەبوهورەیرەو ئەبوسەعیدو حەفسەو ئوموحەبیبەو ئوموسەلەمەو لە ئیبنوعەبباسو عائیشەوە وەریان گرتوە. وە عوبەیدەو ئیبراهیمی نەخەعیو ڕەزینو وەزری کوڕی حەبیشو سەعیدی کوڕی جوبەیرو ئیبنوسیرینو حەسەنو قەتادەو زەحاكو کەلبیو موقاتیلو عوبەیدی کوڕی ئەبومەریەم کەسانی تریش هەر وایان وتوە.

## باسی ئەو بەڵگانە لەسەر نوێژی ناوەڕاست کە نوێژی عەسرە

ئیمامی ئەحمەد ڕیوایەتی کردوە لە عەلی یەوە، دەڵێت: پێغەمبەری خودا(ﷺ) لە ڕۆژی ئەحزابدا فەرمووی: (خەریکیان کردین لە نوێژی ناوەڕاست، نوێژی عەسر، خودای گەورە دڵەکانیانو ماڵەکانیان پڕ بکات لە ئاگر) پاشان لە نێوان مەغریبو عیشادا نوێژی عەسری کرد[2] موسلیم هەر وا ڕیوایەتی کردوە[3] نەسائیش[4] بوخاریو موسلیمو ئەبوداوودو تیرمیزیو نەسائیو کەسانی تریش لە خاوەنی موسنەدو سونەنەکانیش هەر ڕیوایەتیان کردوە لە عەلیەوە لە چەندین ڕێگاوە[5]. وە فەرموودەکەی ڕۆژی ئەحزاب کە بت پەرستەکان پێغەمبەری خوداو(ﷺ) هاوەڵەکانی لە کردنی نوێژی عەسر لەو ڕۆژەدا ئەمە ڕیوایەت کراوە لە کۆمەڵێ لە هاوەڵەکانەوە، ناویان بێنین باسەکە درێژە دەکێشێ

---

[1] فتح الباري(۲/۱۲)، مسلم(۱/۹۰).

[2] أحمد(۱/۱۱۳)، سەحیحە.

[3] مسلم(۱/٤۳۷).

[4] النسائي في الکبری(٦/۳۰۳)، سەحیحە.

[5] فتح الباري(٦/۱۲٤)(۷/٤٦۷)(۸/٤۳)(۱۱/۱۹۷)، مسلم(۱/٤۳٦)، أبوداود(۱/۲۸۷)، تحفة الاحوذي(۸/۳۲۸)، النسائي(۱/۲۳٦)، أحمد(۱/۱۳۷).

مەبەست لەم ڕیوایەتە لەوانەوە ئەوەیە کە نوێژی ناوەڕاست نوێژی عەسرە. موسلیم دیسان ڕیوایەتی کردوە لە فەرموودەکەی ئیبنومەسعودو بەرائی کوڕی عازیبەوە(ڕەزای خوایان لێ بێ)[1] وە ئیمامی ئەحمەد ڕیوایەتی کردوە لە سەمورەوە کە پێغەمبەری خودا(ﷺ) فەرموویەتی: (نوێژی ناوەڕاست نوێژی عەسرە)[2] وە لە وتەیەکی ترا هاتوە لە پێغەمبەری خودا(ﷺ) فەرموویەتی: (حافظوا علی الصلوات, الصلوة الوسطی) لە نوێژەکان بەتایبەتی ئەو نوێژەی لە ناوەڕاست. ئەو نوێژەی ناو لێنا بۆمان بە نوێژی عەسر.[3] وە لە وتەیەکی تریشا پێغەمبەری خودا(ﷺ) فەرمووی: (ئەوە نوێژی عەسرە) ئەبوجەعفەر دەڵێت: پرسیاری لێ کرا دەربارەی نوێژی ناوەڕاست[4] تیرمیزیش ڕیوایەتی کردوەو دەڵێت فەرموودەیەکی حەسەنی سەحیحە[5]. وە ئەبوحاتەمی کوڕی حبان لە سەحیحەکەیدا ڕیوایەتی کردوە لە عەبدوڵلاوە دەڵێت: پێغەمبەری خودا(ﷺ) فەرمووی: (نوێژی ناوەڕاست نوێژی عەسرە)[6] تیرمیزی ڕیوایەتی کردوە لە ئیبنومەسعودەوە دەڵێت: پێغەمبەری خودا(ﷺ) فەرمووی: (نوێژی ناوەڕاست نوێژی عەسرە) پاشان دەڵێت: فەرموودەیەکی حەسەنی سەحیحە[7] موسلیمش لە سەحیحەکەیدا هێناویەتی بەم وتەیە: (سەرقاڵیان کردین لە نوێژی ناوەڕاست، نوێژی عەسر)[8] ئەم دەقانە لەم باسەدا هیچ شتێکی تر هەڵناگرێ، ئەم فەرموودە سەحیحە جەخت لەسەر ئەوە دەکاتەوە کە ڕیوایەت کراوە لە ئیبنوعومەرەوە لە پێغەمبەری خوداوە(ﷺ) کە فەرموویەتی: (ئەوەی نوێژی عەسری دەچێت هەروەك ئەوە وایە ماڵو خێزانی تالان کرا بێت)[9] وە لە فەرموودەی سەحیحا هاتوە لە بورەیدەی کوڕی حوسەیبەوە(حُصَیب) لە پێغەمبەرەوە(ﷺ)(زوو نوێژ بکەن لە ڕۆژی هەوردا، چونکە هەرکەسێ نوێژی عەسر نەکات کرداری بە فیڕۆ چووە)[10].

---

[1] مسلم(١/٤٣٧-٤٣٨).

[2] أحمد(٥/٢٢)، مەتنەکەی سەحیحە.

[3] أحمد(٥/٨)، مەتنەکەی سەحیحە.

[4] أحمد(٥/٧)، حەسەنی سەحیحە.

[5] تحفة الاحوذي(٨/٣٢٨)، حەسەنی سەحیحە.

[6] إبن حبان(٣/١٢١)، سەحیحە.

[7] تحفة الاحوذي(٨/٣٢٩)، سەحیحە.

[8] مسلم(١/٤٣٧).

[9] مسلم(١/٤٣٦).

[10] إبن ماجة(١/٢٢٤)، سەنەدەکانی باشە.

## قەدەغەکردنی قسە کردن لە نوێژدا

خودای مەزن ئەفەرموێت: ﴿وَقُومُواْ لِلَّهِ قَـٰنِتِينَ﴾ بە گەردنکەچی بوەستن بۆ خودا لە نوێژدا. واتە: بە لەسەرخۆیی‌و گەردنکەچی‌و زەلیلی لەبەردەم خودای گەورەدا ڕابوەستن ئەمە ئەوە دەگەیەنێ کە نابێ لە کاتی نوێژ کردنا قسە بکرێت، چونکە پێچەوانەی نوێژ کردنە. هەر بۆیە پێغەمبەری خودا(ﷺ) کاتێ وەڵامی ئیبنومەسعودی نەدایەوە کە سەلامی لێکرد کە نوێژی دەکرد، پاشان پۆزشی(اعتذر) بۆ هێنایەوەو فەرمووی: (بێگومان لە نوێژ کردنا سەرقاڵی هەیە)[1](واتە: کاتی یادی خودایە) وە لە سەحیحی موسلیما هاتوە کە پێغەمبەری خودا(ﷺ) فەرمووی بە مەعاویەی کوڕی حەکەمی ئەسلەمی کاتێ کە لە نوێژا قسەی کرد(ئەم نوێژە بۆ ئەوە ناشێ کە قسەی خەڵکی تێکەڵ بکرێ بەڵکو بریتیە لە سبحان اللهو الله أکبرو یادی خودا کردن)[2] وە ئیمامی ئەحمەد ڕیوایەتی کردوە لە زەیدی کوڕی ئەرقەمەوە(الارقم) دەڵێت: پیاوێ لە سەردەومی پێغەمبەرا(ﷺ) قسەی لەگەڵ هاوەڵەکەیدا کرد بۆ پێویستیەك لە کاتی نوێژا، هەتا ئەم ئایەتە هاتە خوارەوە: ﴿وَقُومُواْ لِلَّهِ قَـٰنِتِينَ﴾ بە گەردنکەچی بوەستن بۆ خودا لە نوێژدا. فەرمانمان پێدرا بە بێدەنگی(لە نوێژدا)[3] زانایانی فەرموودە ڕیوایەتیان کردوە جگە لە ئیبنوماجە[4].

## نوێژی ترس

خودای مەزن ئەفەرموێت: ﴿ فَإِنْ خِفْتُمْ فَرِجَالًا أَوْ رُكْبَانًا فَإِذَآ أَمِنتُمْ فَٱذْكُرُواْ ٱللَّهَ كَمَا عَلَّمَكُم مَّا لَمْ تَكُونُواْ تَعْلَمُونَ﴾ ئەگەر ترسێکتان لەسەر بوو(بە پیادەیی یان بە سواری) هەرکاتێکیش ترستان بەسەر چوو(چۆن خودا فێری کردوون) یادی بکەن کە لە پێشدا نەتاندەزانی. کاتێ کە خودای گەورە فەرمانی دا بە عەبدەکانی کە پارێزگاری لە نوێژەکانیان بکەن‌و بەچاکی بەجێی بێنن‌و سنوورەکان بپارێزن، جەختیشی کردۆتەوە لەسەر ئەوانەی کە سەرقاڵیان هەیەو ناتوانن بە تەواوی‌و ڕێك‌و پێکی لە هەندێ کاتا پێی هەڵسن وەك کاتی شەڕو ڕووبەڕووبوونەوەی دوژمن. ئەفەرموێت: ﴿ فَإِنْ خِفْتُمْ فَرِجَالًا أَوْ رُكْبَانًا﴾ ئەگەر ترسێکتان هەبوو(بە پیادەیی یان بە سواری) هەرچۆنێ دەتوانن وا نوێژ بکەن. واتە: ڕوو بە قیبلە یان پشت بە قیبلە بێ. وەك مالیك دەڵێت لە نافیعەوە: ئیبنوعومەر ئەگەر پرسیاری

---

[1] مسلم(١/٣٨٢).

[2] مسلم(١/٣٨١).

[3] أحمد(٤/٣٦٨)، سەحیحە.

[4] فتح الباري(٣/٨٨)، مسلم(١/٣٨٣)، أبوداود(١/٥٨٣)، تحفة الاحوذي(٨/٣٣٠)، النسائي(٣/١٨)، سەحیحە.

لیٚ بکرایه دەربارەی نوێژی ترس باسی دەکردو پاشان دەیوت: ئەگەر ترسەکە زۆر بوو بە پیادەیی یان بە سواری نوێژ بکەن، ڕوو بە قیبلە بێ یان ڕوو لە قیبلە نەبێ. نافیع دەڵێت: من وا نازانم ئیبنوعومەر ئەوقسەیە بکات مەگین لەلایەن پێغەمبەرەوە(ﷺ)(بیستویەتی)[1] بوخاریو موسلیم ڕیوایەتیان کردوە[2] موسلیمو ئەبوداوودو نەسائیو ئیبنوماجەو ئیبنوجەریر ڕیوایەتیان کردوە لە ئیبنوعەبباسەوە، دەڵێت: خودای مەزن نوێژی فەرز کردوە لەسەر زمانی پێغەمبەرەکەتان(ﷺ) لە نیشتەجێدا(الحضر) چوارو لە سەفەردا دوان لە کاتی ترسدا یەك ڕەکات[3]. حەسەنی بەسریو قەتادەو زەححاكو کەسانی تریش هەر وایان وتوە[4] بوخاری دەڵێت: (باب الصلاة عند مناهضة الحصون و لقاء العدو) ئەوزاعی دەڵێت: ئەگەر لە خۆ ئامادەکردنا بوون بۆ پەلاماردانو نەیان دەتوانی نوێژن بکەن با بە ئیشارەت بیکەن هەرکەسەو بۆ خۆی نوێژ بکا. ئەگەر بە هێمایش نەیان توانی با دوای بخەن هەتا شەڕەکە تەواو دەبێو نامێنێ یان ترسیان نامێنێ با دوو ڕەکات بکەن، ئەگەر نەیان توانی دوو ڕەکات بکەن با یەك ڕەکات بکەنو دوو سوژدە ببەن. ئەگەر ئەوەشیان نەتوانی(الله أکبر) کردن جێگای ناگرێتەوە، دوای دەخەن هەتا ترسیان نامێنێ. مەکحولیش هەر وای وتوە. ئەنەسی کوڕی مالیك دەڵێت: کاتی پەلاماردان قەڵایەك بوو خۆی پەنا دا لە کاتی دەرکەوتنی بەرەبەیانداو شەڕەکە دەستی پێکردبوو نەیان دەتوانی نوێژ بکەن، نوێژمان نەکردهەتا خۆربەرز بوەوە. ئێمە لەگەڵ ئەبوموساداا بووین نوێژمان کرد سەرکەوتنمان بەدەست هێنا بوو، دنیاو ئەوەی کە تیایەتی ئەوەندەی ئەو نوێژە دڵخۆشی نەکردوم. ئەمە وتەی(لفظ) بوخاریە[5].

### فەرماندان بە تەواوکردنی نوێژ لە کاتی بێ ترسیدا

خودای مەزن ئەفەرموێت: ﴿فَإِذَآ أَمِنتُمۡ فَٱذۡكُرُواْ ٱللَّهَ﴾ کە ترستان نەما ئەوسا یادی خودا بکەن. واتە: چۆن فەرمانتان پێکراوە نوێژەکانتان بکەن. ڕەکوعو سوژدەو هەڵسانو دانیشتنەکانی تەواو بکەن بە گەردنکەچیو زەلیلیەوە ﴿كَمَا عَلَّمَكُم مَّا لَمۡ تَكُونُواْ تَعۡلَمُونَ﴾ بەو جۆرەی کە فێری کردون کە ئەوسا نەتاندەزانی. واتە: خودای مەزن ئەو بەهرەی پێ بەخشینو شارەزاو فێری کرد لە دنیاو لە قیامەتا سوودتان پێ بگەیەنێ، سا ئێوەش وەری بگرنو شوکرانە بژێر بنو یادی خودای لەسەر بکەن.

---

[1] الموطأ(١/١٨٤)، سەحیحە.

[2] فتح الباري(٨/٤٦)، مسلم(١/٥٧٤).

[3] مسلم(١/٤٧٨-٤٧٩)، أبوداود(٢/٤٠)، النسائي(٣/١٦٩)، إبن ماجة(١/٣٣٩)، الطبري(٥/٢٤٧).

[4] الطبري(٥/٢٤٠/٢٤١).

[5] فتح الباري(٢/٥٠٣).

وەك خودای گەورە دوای نوێژی ترس ئەفەرموێت: ﴿فَإِذَا ٱطۡمَأۡنَنتُمۡ فَأَقِيمُواْ ٱلصَّلَوٰةَۚ إِنَّ ٱلصَّلَوٰةَ كَانَتۡ عَلَى ٱلۡمُؤۡمِنِينَ كِتَٰبًا مَّوۡقُوتًا ﴾[1] جا هەرکاتێ ترستان نەما نوێژەکانتان بە ڕێكو پێکی بکەن، بەڕاستی نوێژ فەرزێکی کات بۆ دیاری کراوە. بەو زوانە لە سورەتی نیسائدا ئەو فەرموودانەی باسی نوێژی ترسو شێوەکانی دەکات دێت لەلای ئەم ئایەتەدا کە خودای مەزن ئەفەرموێت: ﴿وَإِذَا كُنتَ فِيهِمۡ فَأَقَمۡتَ لَهُمُ ٱلصَّلَوٰةَ ﴾[2] ئەگەر تۆش(ئەی موحەممەد(ﷺ) لە جەنگدا) لەگەڵیاندا بوویو پێش نوێژیت بۆ دەکردن.

﴿وَٱلَّذِينَ يُتَوَفَّوۡنَ مِنكُمۡ وَيَذَرُونَ أَزۡوَٰجًا وَصِيَّةً لِّأَزۡوَٰجِهِم مَّتَٰعًا إِلَى ٱلۡحَوۡلِ غَيۡرَ إِخۡرَاجٖۚ فَإِنۡ خَرَجۡنَ فَلَا جُنَاحَ عَلَيۡكُمۡ فِي مَا فَعَلۡنَ فِيٓ أَنفُسِهِنَّ مِن مَّعۡرُوفٖۗ وَٱللَّهُ عَزِيزٌ حَكِيمٞ ﴿٢٤٠﴾ وَلِلۡمُطَلَّقَٰتِ مَتَٰعُۢ بِٱلۡمَعۡرُوفِۖ حَقًّا عَلَى ٱلۡمُتَّقِينَ ﴿٢٤١﴾ كَذَٰلِكَ يُبَيِّنُ ٱللَّهُ لَكُمۡ ءَايَٰتِهِۦ لَعَلَّكُمۡ تَعۡقِلُونَ ﴿٢٤٢﴾﴾

**نەسخ بوونەوەی ئەم ئایەتە**

خودای مەزن ئەفەرموێت: ﴿وَٱلَّذِينَ يُتَوَفَّوۡنَ مِنكُمۡ وَيَذَرُونَ أَزۡوَٰجًا وَصِيَّةً لِّأَزۡوَٰجِهِم مَّتَٰعًا إِلَى ٱلۡحَوۡلِ غَيۡرَ إِخۡرَاجٖۚ فَإِنۡ خَرَجۡنَ فَلَا جُنَاحَ عَلَيۡكُمۡ فِي مَا فَعَلۡنَ فِيٓ أَنفُسِهِنَّ مِن مَّعۡرُوفٖۗ وَٱللَّهُ عَزِيزٌ حَكِيمٞ﴾ ئەوانەی لە ئێوە دەمرنو ژنەکانیان بەجێ دێڵن، ڕاسپێرن: هەتا ساڵێك بەخێویان بکەن دەری نەکەن، ئەگەر هەر بە خواستی خۆیان چوونە دەرێ(بۆ کارێکی خوا پەسەند) ئێوە گوناهتان ناگات. خودا خاوەن دەستەڵاتی لە کارزانە. زۆرینەی زانایان دەڵێن ئەم ئایەتە نەسخ بوەتەوە بەو ئایەتەی پێش خۆی. کە خودای مەزن ئەفەرموێت: ﴿يَتَرَبَّصۡنَ بِأَنفُسِهِنَّ أَرۡبَعَةَ أَشۡهُرٖ وَعَشۡرٗا ﴾[3]. ژنەکانیان هەتا چوار مانگو دە ڕۆژ چاوەنۆڕبن. بوخاری ڕیوایەتی کردوە لە ئیبنوزوبەیرەوە، دەڵێت: وتم بە عوسمانی کوڕی عەفان ﴿وَٱلَّذِينَ يُتَوَفَّوۡنَ مِنكُمۡ وَيَذَرُونَ أَزۡوَٰجًا﴾ ئەوانەی لە ئێوە دەمرنو ژنەکانیان بەجێ دێڵن. ئەو ئایەتەی تر نەسخی کردۆتەوە بۆچی نوسیووتە یان وازی لێ ناهێنی؟ دەڵێت: ئەی برازای خۆم، هیچ شتێکی لێ ناگۆڕم لە شوێنی خۆیدا[4] مانای ئەو ناڕونیە کە ئیبنوزوبەیر دەڵێت بە عوسمانی کوڕی عەفان: ئەگەر حوکمەکەی نەوسخ بوەتەوە بە چوار مانگو دە ڕۆژ، حیکمەت چیە لە هێشتنەوەی ڕەسمی ئایەتەکە لەگەڵ نەمانی حوکمەکەیدا؟ گەورەی موسوڵمانان

---

[1] النساء(١٠٣).

[2] النساء(١٠٢).

[3] البقرة(٢٣٤).

[4] فتح الباري(٨/٤٨).

وەڵامی دایەوە، کە ئەو فەرمانە تەوقیفیە(توفیقي) وە من بینیم لەم مەسحەفەدا(المصحف) نوسراوە، دواکەیشی هەر دوای ئەمە نوسراوە، منیش لە هەر شوێنێکا بیبینم دەینوسم. ئیبنوئەبی حاتەم ڕیوایەتی کردوە لە ئیبنوعەبباسەوە لەم ئایەتەدا کە خودای مەزن ئەفەرموێت: ﴿وَٱلَّذِينَ يُتَوَفَّوْنَ مِنكُمْ وَيَذَرُونَ أَزْوَٰجًا وَصِيَّةً لِّأَزْوَٰجِهِم مَّتَٰعًا إِلَى ٱلْحَوْلِ غَيْرَ إِخْرَاجٍ﴾ ئەوانەی لە ئێوە دەمرن‌و ژنەکانیان بەجێ دێڵن، ڕابسپێرن: هەتا ساڵێك بەخێویان بکەن‌و دەریان نەکەن، ئەوسا ئەوانەی دەمرن هەتا ساڵێك نەفەقەو شوێنی لەوماڵەدا دەبوو، ئایەتی میرات نەسخی کردەوەو چوار یەك یان هەشت یەکی دانا بۆ ئەوانەی مێردیان دەمرێ[1] وە ڕیوایەت کراوە لە ڕێگەی عەلی کوڕی ئەبوتەلحەوە، لە ئیبنوعەبباسەوە، دەڵێت: ئەگەر پیاوێ بمردایەو ژنەکەی لە دوا بەجێ بمایە، ساڵێك ژنەکە ماتەمینی دەگرت لە ماڵەکەیدا، لە ماڵەکەی ئەو خەرجیان بۆ دەکرد. پاشان دوای ئەوە ئەم ئایەتەی نارده خوارەوە: ﴿وَٱلَّذِينَ يُتَوَفَّوْنَ مِنكُمْ وَيَذَرُونَ أَزْوَٰجًا يَتَرَبَّصْنَ بِأَنفُسِهِنَّ أَرْبَعَةَ أَشْهُرٍ وَعَشْرًا﴾[2] ئەوانەی لێتان دەمرن‌و ژنانیان لێ بەجێ دەمێنێ، ژنەکانیان هەتا چوار مانگو دە ڕۆژ چاوەنواڕ بن. ئەمە عیددەی ئەو ژنانەیە مێردیان دەمرێت، مەگین ئەو ژنە سکی پڕ بێ، عیددەی ئەمیش دانانی سکەکەیەتی. خودای مەزن ئەفەرموێت: ﴿وَلَهُنَّ ٱلرُّبُعُ مِمَّا تَرَكْتُمْ إِن لَّمْ يَكُن لَّكُمْ وَلَدٌ ۚ فَإِن كَانَ لَكُمْ وَلَدٌ فَلَهُنَّ ٱلثُّمُنُ مِمَّا تَرَكْتُم﴾[3] ئەگەر ئێوە مردن‌و منداڵتان نەبوو، ژنەکانتان چوار یەکی میراتیتان دەگرن. ئەگەر منداڵیشتان هەبوو، ژنتان هەشت یەکیان پێ دەبڕێ. خودای مەزن میراتی ژنانی ڕوون کردەوەو ڕاسپاردەو نەفەقەی واز لێ هێنا[4]. وە ڕیوایەتیش کراوە لە موجاهیدو حەسەن‌و عیکرمەو قەتادەو زەححاك‌و ڕەبیع‌و موقاتیلی کوڕی حەیان وتیان: ئەم ئایەتە: ﴿أَرْبَعَةَ أَشْهُرٍ وَعَشْرًا﴾[5] ئەو ئایەتەی نەسخی کردۆتەوە. بوخاری ڕیوایەتی کردوە لە موجاهیدەوە، ﴿وَٱلَّذِينَ يُتَوَفَّوْنَ مِنكُمْ وَيَذَرُونَ أَزْوَٰجًا﴾ ئەوانەی لە ئێوە دەمرن‌و ژنەکانیان بەجێ دێڵن. دەڵێت: ئەم عیددەیە لەسەر کەس‌و کاری مێردەکەی واجب بوو. خودای مەزن ئەم ئایەتەی نارده خوارەوە: ﴿وَٱلَّذِينَ يُتَوَفَّوْنَ مِنكُمْ وَيَذَرُونَ

---

[1] إبن أبي حاتم غ: (٢/٨٧١).

[2] البقرة(٢٣٤).

[3] النساء(١٢).

[4] الطبري(٥/٢٥٥).

[5] إبن أبي حاتم غ: (٢/٨٧٥-٨٧٦).

أَزْوَٰجًا وَصِيَّةً لِّأَزْوَٰجِهِم مَّتَٰعًا إِلَى ٱلْحَوْلِ غَيْرَ إِخْرَاجٍ ۚ فَإِنْ خَرَجْنَ فَلَا جُنَاحَ عَلَيْكُمْ فِي مَا فَعَلْنَ فِيٓ أَنفُسِهِنَّ مِن مَّعْرُوفٍ ﴾ ئەوانەی لە ئێوە دەمرن‌و ژنەکانیان بەجێ دێڵن، ڕاسپێرن: هەتا ساڵێك ژنەکانیان بەخێو بکەن‌و دەریان نەکەن. ئەگەر هەر بە خواستی خۆیان چوونە دەرێ(بۆ کارێکی خوا پەسەند) ئێوە گوناهتان ناگات. دەڵێت: خودای مەزن ساڵێکی بۆ دانان. حەوت مانگو بیست ڕۆژ بە ڕاسپاردەکە. ئەگەر ئەو ژنە بیویستایە بەپێی ڕاسپاردەکە دادەنیشت‌و حەزیشی بکردایە دەڕۆشت. وەك خودای مەزن ئەفەرموێت: ﴿غَيْرَ إِخْرَاجٍ ۚ فَإِنْ خَرَجْنَ فَلَا جُنَاحَ عَلَيْكُمْ ﴾ دەریان مەکەن، ئەگەر بە خواستی خۆیان چوونە دەرێ ئێوە هیچ گوناهتان ناگات. ئەو عیددەیە لەسەر ژنەکە واجبە، وەك موجاهید دەڵێت، عەتا دەڵێت: ئیبنوعەبباس دەڵێت: ئەم ئایەتە عیددەکەی نەسخ کردۆتەوە لەلای کەس‌و کاری. ئارەزوی خۆیەتی لە هەرکوێ تەواوی دەکا. وەك خودای مەزن ئەفەرموێت: ﴿غَيْرَ إِخْرَاجٍ ﴾ دەری مەکەن. عەتا دەڵێت ئارەزوی خۆیەتی عیددەکەی لای کەس‌و کاری تەواو دەکاو لەسەر ڕاسپاردەی مێردەکەی دادەنیشێ یان دەردەچێت. بەپێی ئەم ئایەتەی کە خودای مەزن ئەفەرموێت: ﴿فَلَا جُنَاحَ عَلَيْكُمْ فِي مَا فَعَلْنَ ﴾ ئێوە هیچ گوناهتان لەسەر نیە، لەوەی ئەو ژنانە دەیکەن دەربارەی خۆیان. عەتا دەڵێت: پاشان ئایەتی میرات هات‌و مانەوەی لەوماڵەدا نەسخ کردەوە، ئەو ژنە ئارەزوی خۆی بووە لە هەرکوێ دانیشێ. شوێنی تایەبەت نەما[1] عەتاو ئەوانەی کە لەسەر قسەی ئەمن دەڵێن: ئەم ئایەتە نەسخ بوەتەوە با ئایەتی میرات. ئەگەر ویستیان زیاتر بمێننەوە لە چوار مانگو دە ڕۆژ ئارەزوی خۆیانە. بەڵام ئەگەر ویستیان چوار مانگو دە ڕۆژ لەو ماڵە دانیشن، ئەو مانەوەیە لەسەر میراتی مردوەکە نیە، ئەمە جێگای ناکۆکیە لەنێوان ئیمامەکاندا. (زانایان) ئەمەیان کردوە بە بەڵگە لەسەر دانانی شوێن بۆ مانەوەی ئەو ژنە لە ماڵی مێردەکەیدا کە مردوە کە ئیمامی مالیك ڕیوایەتی کردوە لە موتەئەکەیدا(الموطأ) لە زەینەبی کچی کەعبی کوڕی عوجزەدا(عُجْزة) کە فورەیعەی کچی مالیکی کوڕی سینان، کە کچی ئەبوسەعیدی خودری بوو(ڕەزای خوایان لێ بێ) هەواڵی پێدا کە هاتوە بۆ لای پێغەمبەری خودا(ﷺ) پرسی پێکرد کە بچێتەوە ناو کەس‌و کاری خۆی کە خودریەکانن. چونکە مێردەکەی دەرچووە بە شوێن چەند عەبدێکیدا کە ڕایان کردوە، عەبدەکان لە لای قدوم(القدوم) کە شوێنێکە پێی گەیشتوون‌و کوشتویانە. فەریعە دەڵێت: پرسیارم لە پێغەمبەری خودا کرد(ﷺ) کە بگەڕێمەوە بۆ لای کەس‌و کارم لە بەنی خودەریەکان، چونکە مێردەکەم شوێنێکی نەبوە بۆم بوجێ بهێڵێ تێیدا دانیشم‌و بژێویشی نیە. دەڵێت: پێغەمبەری

[1] البخاري(٤٥٣١/٥٣٤٤).

خودا(ﷺ) فەرموویەتی: (بەڵێ)، دەڵێت: ڕۆشتم کاتێ کە گەیشتمە حوجرەکە، پێغەمبەری خودا(ﷺ) بانگی کردم یان فەرمانی دا بانگیان کردم بۆ لای فەرمووی: (چیت وت؟) ئەو بەسەرهاتەم بۆ گێڕایەوە کە بۆم باس کرد دەربارەی مێردەکەم. فەرمووی: (لەماڵەکەی خۆت دانیشە تا ئەو کاتەی کە ماوەی چاوەنواڕی تەواو دەبێ) دەڵێت: چوار مانگو دە ڕۆژم تەواو کرد. دەڵێت: لە سەردەمی عوسمانی کوڕی عەفاندا، ناردی بە شوێنماو پرسیاری لێکردم لەو بارەیەوە، منیش بۆم باس کرد شوێنی ئەو بڕیارەی(پێغەمبەر(ﷺ)) بەوە کاری دەکرد[1] ئەبوداوودو تیرمیزیو نەسائیو ئیبنوماجە هەر بەو جۆرە ڕیوایەتیان کردوە[2] تیرمیزی دەڵێت: فەرموودەیەکی حەسەنی سەحیحە.

### قەرەبوو کردنەوەی ژنی تەڵاق دراو

خودای مەزن ئەفەرموێت: ﴿وَلِلْمُطَلَّقَٰتِ مَتَٰعٌۢ بِٱلْمَعْرُوفِ ۖ حَقًّا عَلَى ٱلْمُتَّقِينَ ﴾ ژنانێ کە تەڵاق ئەدرێن بەشی ڕەوای خۆیان هەیە، کە پێکهێنانی ئەم کارە، بڕیارە بۆ لە خوا ترسان. عەبدوڕەحمانی کوڕی زەیدی کوڕی ئەسلەم دەڵێت: کاتێ ئەم ئایەتە هاتە خوارەوە: ﴿مَتَٰعًۢا بِٱلْمَعْرُوفِ ۖ حَقًّا عَلَى ٱلْمُحْسِنِينَ ﴾[3] بەشی ڕەوای خۆیان هەیە، بەجێ هێنانی لەسەر چاکەکارانە. پیاوێك دەڵێت: ئەگەر ویستم چاکە بکەم دەیکەم، ئەگەر ویستیشم نایکەم. خودای گەورە ئەم ئایەتەی ناردە خوارەوە کە ئەفەرموێت: ﴿وَلِلْمُطَلَّقَٰتِ مَتَٰعٌۢ بِٱلْمَعْرُوفِ ۖ حَقًّا عَلَى ٱلْمُتَّقِينَ ﴾[4] ژنانێ کە تەڵاق ئەدرێن. بەشی ڕەوای خۆیان هەیە. ئەوە پێویستە لەسەر پارێزگاران. هەندێ لە زانایان ئەم ئایەتەیان کردۆتە بەڵگە لەسەر دانی قەرەبوو بە هەموو تەڵاق دراوێك، ئیتر ئەو ژنە مارەیی بۆ دانراوە یان بۆی دانەنراوە، یان تەڵاق دراوە پێش سەرجێیی کردن لەگەڵی یان سەرجێیی لەگەڵا نەکراوە. سەعیدی کوڕی جوبەیرو کەسانی تریش لە زانایانی پێشینە وایان وتوە[5]. ئیبنوجەریریش هەرئەم ڕایەی هەڵبژاردوەپاشان خودای مەزن ئەفەرموێت: ﴿كَذَٰلِكَ يُبَيِّنُ ٱللَّهُ لَكُمْ ءَايَٰتِهِۦ لَعَلَّكُمْ تَعْقِلُونَ ﴾ هەر بەو پێیەش خودا نیشانەکانی خۆی بۆ ئێوە ڕوون دەکاتەوە بەڵکو ئێوە تێ بگەن. واتە: خودا نیشانەکانی خۆی بۆ ئێوە ڕوون دەکاتەوە بۆ ئەوەی تێ بگەن لە حەڵاڵو حەرامو فەرزو سنوورەکانیو ئەوەی فەرمانی پێداون بیکەنو

---

[1] الموطأ(٢/٥٩١)، تیرمیزی ووتی: حەسەنی سەحیحە.

[2] أبوداود(٢/٧٧٣)، تحفة الاحوذي(٤/٣١٩/٣٩٠)، النسائي(٦/٢٠٠)، إبن ماجة(١/٦٥٤).

[3] البقرة(٢٣٦).

[4] الطبري(٥/٢٦٤).

[5] الطبري(٥/٢٦٣).

ئەوەی قەدەغەی کردوە لێتان وازی لێ بێنن، بە چاکی بۆی ڕوون کردونەتەوە بۆ ئەوەی لە کاتی پێویستیاندا سوودی لێ وەربگرن.

﴿أَلَمْ تَرَ إِلَى الَّذِينَ خَرَجُوا مِن دِيَارِهِمْ وَهُمْ أُلُوفٌ حَذَرَ الْمَوْتِ فَقَالَ لَهُمُ اللَّهُ مُوتُوا ثُمَّ أَحْيَاهُمْ ۚ إِنَّ اللَّهَ لَذُو فَضْلٍ عَلَى النَّاسِ وَلَٰكِنَّ أَكْثَرَ النَّاسِ لَا يَشْكُرُونَ ﴿٢٤٣﴾ وَقَاتِلُوا فِي سَبِيلِ اللَّهِ وَاعْلَمُوا أَنَّ اللَّهَ سَمِيعٌ عَلِيمٌ ﴿٢٤٤﴾ مَّن ذَا الَّذِي يُقْرِضُ اللَّهَ قَرْضًا حَسَنًا فَيُضَاعِفَهُ لَهُ أَضْعَافًا كَثِيرَةً ۚ وَاللَّهُ يَقْبِضُ وَيَبْسُطُ وَإِلَيْهِ تُرْجَعُونَ ﴿٢٤٥﴾﴾

خودای مەزن ئەفەرموێت: ﴿أَلَمْ تَرَ إِلَى الَّذِينَ خَرَجُوا مِن دِيَارِهِمْ وَهُمْ أُلُوفٌ حَذَرَ الْمَوْتِ﴾ ئایا تۆ ئەوانەت نەدی بە هەزاران لەو کەسانەی ترسی مردن وای لێکردن زێدی خۆیان بەجێ بێڵن؟ ئیبنوئەبی حاتەم ڕیوایەتی کردوە لە ئیبنوعەبباسەوە، دەڵێت: ئەوانە خەڵکی شارێك بوون پێی دەوترا داوەردان(دَاوَرْدَان) عەلی کوڕی عاسم دەڵێت: ئەوانە خەڵکی داوردان بوون شارێکە(گوندێکە) چەند کیلۆمەترێك لە واستەوە(الواسط) دوورە. وەکیعی کوڕە جەڕاح ڕیوایەتی کردوە لە تەفیرەکەیدا لە ئیبنوعەبباسەوە لەم ئایەتەدا: ﴿أَلَمْ تَرَ إِلَى الَّذِينَ خَرَجُوا مِن دِيَارِهِمْ وَهُمْ أُلُوفٌ حَذَرَ الْمَوْتِ﴾ ئایا ئەوانەت نەدی بە هەزاران لەو کەسانەی ترسی مردن وای لێکردن زێدی خۆیان بەجێ بێڵن. دەڵێت: ئەوانە چوار هەزار کەس بوون لە زێدی خۆیان ڕایان کرد لە ترسی تاعون‌و وتیان: دەچین بۆ سەر زەمینێ مردنی تێدا نەبێ، چوون بۆ فلان‌و فلانە شوێن، خودای مەزن فەرمووی: ﴿مُوتُوا﴾ بمرن، ئەوانیش مردن، پێغەمبەرێ، لە پێغەمبەران بە لایاندا تێپەڕی، لە خودا پاڕایەوە زیندویان بکاتەوە، خودایش زیندوی کردنەوە. ئەمە ئەوەیە کە خودای مەزن ئەفەرموێت: ﴿أَلَمْ تَرَ إِلَى الَّذِينَ خَرَجُوا مِن دِيَارِهِمْ وَهُمْ أُلُوفٌ حَذَرَ الْمَوْتِ﴾ ئایا تۆ ئەوانەت نەدی بە هەزاران لەو کەسانەی ترسی مردن وای لێ کردن زێدی خۆیان بەجێ بێڵن. زۆرێك لە زانایانی پێشینە باسیان کردوە کە ئەو گەلە خەڵکی شارێك بوون لە سەردەمی نەوەی ئیسرائیلیدا. زۆر بێزار بوون لە زێدی خۆیان‌و تووشی نەخۆشی‌و پەتایەك هاتبوون، لە ترسی مردن لە وڵاتی خۆیان ڕایان کردو چوونە دەرەوە. گەیشتنە شیوێکی فراوان‌و شیوەکەیان پڕ کرد(ئەوەندە زۆر بوون) خودای گەورە دوو فریشتەی بۆ ناردن، فریشتەیەکیان لە خواری شیوەکەوەو ئەوی تریان لەسەر شیوەکەوە، هەردووکیان بە یەك دەنگ هاواریان دەکرد هەموویان وەك یەك کەس بمرێ مردن، لاشەکانیان بوو بە چەند بەشێکەوە، دیواریان بە دەوردا دروست کراو بونە گۆڕستانێ‌و نەمان پەرش‌و بڵاو بونەوە، ڕۆژگار بە سەریاندا تێپەڕی، پێغەمبەرێ لە پێغەمبەرەکانی نەوەی ئیسرائیل بە لایاندا تێپەڕی پێی دەوترا حیزەقیل(حِزْقِيل) لە خودا پاڕایەوە

لەسەر دەستی ئەودا زیندویان بکاتەوە، خودا داواکەی لێ وەرگرت‌و فەرمانی پێدا کە بڵێ: ئەی ئێسکە پڕاوینە خودا خودا فەرمانی پێداوی کە کۆ ببنەوە، هەموو ئێسکی لاشەکان لە یەکتری کۆبوونەوە. پاشان فەرمانی پێدا بانگەوازی کرد: ئەی ئێسکەکان خودا فەرمانتان پێ دەکات کە گۆشت‌و دەمارو پێستەکانتان بێتەوە(لاشەتان) بە چاوی خۆی دەیبینی یەکیان دەگرتەوە. پاشان فەرمانی دا بانگەوازی کرد: ئەی گیانەکان، خودا فەرمانت پێدەکا هەر گیانێ بگەڕێتەوە بۆ لاشەکەی خۆی. کە تێدا بووە. ئەوانیش هەڵسانەوەو دەیان نواڕی، خودای گەورە زیندوی کردنەوە دوای ئەو ماوە زۆرەی کە مردبوون. دەیان وت: پاکی‌و بێ عەیبی بۆ تۆیە ئەی خودایە هیچ شتێ بۆ پەرستن ناشێ جگە لە تۆ. لە زیندو کردنەوەیاندا پەندو ئامۆژگاری‌و بەڵگەی بەهێزە لەسەر هاتنی ڕۆژی قیامەت بە لاشەو بەدەن، هەر بۆیە خودای مەزن ئەفەرموێت: ﴿إِنَّ ٱللَّهَ لَذُو فَضْلٍ عَلَى ٱلنَّاسِ﴾ خودا سەبارەت بە خەڵکی چاکە دەکا. بەو هەموو نیشانەو بەڵگە مەزنانەی کە بۆی ڕوون‌و ئاشکرا کردوون. ﴿وَلَٰكِنَّ أَكْثَرَ ٱلنَّاسِ لَا يَشْكُرُونَ﴾ بەلام بەشی زۆری مەردم سوپاسی خودا ناکەن[1] واتە: هەڵناسن بە شوکرانە بژێری ئەو بەهرانەی خودا پێی داون لە دین‌و دنیادا. وە لەم بەسەرهاتەدا پەندو ئامۆژگاری هەیە بۆ مەردم کە خۆ لادان هیچ سوودێکی نیە لە قەدەری خودا، هیچ پەنایەك نیە تەنیا پەنای خودا نەبێ، ئا ئەوانە دەرچوون‌و ڕایان کرد خۆیان ڕزگار بکەن لە پەتاو نەخۆشی بۆ ئەوەی ژیان بەسەر بەرن‌و نەمرن، بە پێچەوانەی مەبەستی ئەوانەوە مامەڵەیان لەگەلا کراو بە پەلە مردن یەخەی پێگرتن لە یەك کاتدا. وە هەر لەم شێوەیە ئەم فەرمووە سەحیحە کە ئیمامی ئەحمەد ڕیوایەتی کردوە لە عەبدوڵلای کوڕی عەبباسەوە کاتێ عومەری کوڕی خەتاب دەرچوو بۆ شام، کاتێ کە لە سەرغ(سَرْغ) کە شوێنێکە لە نزیکی شام مەغیسە(مغيثة) تەبوکدا سەرکردەی لەشکرەکانی(شام) هاتنە لای: ئەبوعوبەیدەی جەڕاح‌و هاوەڵەکانی، هەواڵیان پێدا کە نەخۆشی‌و پەتا لە شام بڵاوبۆتەوە، وتووێژەکەی باس کرد. لەو کاتەدا عەبدوڕەحمانی کوڕی عەوف لەوێ بەبو(کە هات) دەڵێت: من زانیاریم لایە لەو بارەیەوە، بیستومە لە پێغەمبەری خودا(ﷺ) کە ئەیفەرموو: (ئەگەر لە زەمینێکدا(چاوە قوڵە) پەیدا بوو ئێوەی تێدا بوون لێی دەرمەچن‌و ڕا بکەن، وە ئەگەر بیستتان(چاوە قوله) پەیدا بووە لە زەمینێکا مەچن بۆ ئەوێ) عومەری کوڕی خەتاب سوپاسی خودای کردو گەڕایەوە[2] لە هەردوو سەحیحەکەیاندا بوخاری‌و موسلیم هێناویانە[3].

---

[1] الطبري(٥/٢٦٦).

[2] أحمد(١/١٩٤)، سەحیحە.

[3] فتح الباري(١٠/١٨٩-١٩٠)(١٢/٣٦١)، مسلم(٤/١٧٤٠).

## هەڵهاتن لە جیهاد ئەمردن نزیك دەخاتەوەو نە دوایشی دەخات

خودای مەزن ئەفەرموێت: ﴿وَقَـٰتِلُوا۟ فِى سَبِيلِ ٱللَّهِ وَٱعْلَمُوٓا۟ أَنَّ ٱللَّهَ سَمِيعٌ عَلِيمٌ﴾ لە ڕێی خودا بچنە غەزاو بزانن کە خودا بیسەرو ئاگادارە. واتە: وەك چۆن خودای گەورە فەرمووی کە خۆ لادانو پاراستن هیچ لە قەدەری خودا ناگۆڕێ، هەر بەو شێوەیەش ڕاکردن لە غەزاو خۆشاردنەوە مردن، تەمەن درێژ ناو کەمیشی ناکاتەوە، بەڵکو ئاکامو ماوەی تەمەن براوەتەوەو ڕۆزیش دیاری کراوە نە زیاد دەکاتو نە کەم. وەك خودای مەزن ئەفەرموێت: ﴿ٱلَّذِينَ قَالُوا۟ لِإِخْوَٰنِهِمْ وَقَعَدُوا۟ لَوْ أَطَاعُونَا مَا قُتِلُوا۟ ۗ قُلْ فَٱدْرَءُوا۟ عَنْ أَنفُسِكُمُ ٱلْمَوْتَ إِن كُنتُمْ صَـٰدِقِينَ﴾[1] ئەوانەی کە خۆیان نەچووبونە غەزا، دەیانوت: بە هاوەڵەکانیان ئەگەر بە قسەیان بکردینایە نەدەکوژران. بڵێ: سا ئەگەر ڕاست دەکەن، خۆتان لە مردن بپارێزن. وە ئەفەرموێت: ﴿وَقَالُوا۟ رَبَّنَا لِمَ كَتَبْتَ عَلَيْنَا ٱلْقِتَالَ لَوْلَآ أَخَّرْتَنَآ إِلَىٰٓ أَجَلٍ قَرِيبٍ ۗ قُلْ مَتَـٰعُ ٱلدُّنْيَا قَلِيلٌ وَٱلْـَٔاخِرَةُ خَيْرٌ لِّمَنِ ٱتَّقَىٰ وَلَا تُظْلَمُونَ فَتِيلًا ﴿٧٧﴾ أَيْنَمَا تَكُونُوا۟ يُدْرِككُّمُ ٱلْمَوْتُ وَلَوْ كُنتُمْ فِى بُرُوجٍ مُّشَيَّدَةٍ﴾[2] دەیان وت: ئەی پەروەرێنمان، بۆچی غەزات بۆ نووسیوین، چی دەبوو تا ماوەیەکی تر دوات خستینایە؟ بڵێ: ژیانی دنیا کەمو کورتەو بۆ ئەوانەی ترسیان لە خودا هەیە. ژیانی ئەولا زۆر باشترەو بە ئەندازەی داوی ناو دەنکە خورما، کەس ناهەقی لێ ناکرێ. لە هەرکوێ بن تەنانەت ئەگەر لە قەڵای زۆر قایمیش(خۆ بشارنەوە) مردن هەر پێتان دەگا. ڕیوایەتمان کردوە لە سەرکردەو پێشەنگی سوپاکانەوە، پارێزەری سنووری ئیسلام، شمشێری خودای هەمیشە ئامادە لەسەر سەری دوژمنانی خودا، ئەبوسولەیمان خالیدی کوڕی وەلید(ڕەزای خوای لێ بێ) کە لە کاتی سەرە مەرگا دەیوت: من ئامادەی فڵانو فلان جەنگ بووم، هیچ جێگەیە لە لاشەمدا نیە شوێنی تیرێك یان شمشێرێکی پێوە دیار نەبێ، ئەوسا ئێستا لەسەر جێگەکەی خۆم دەمرم وەك چۆن وشتر مردار دەبێتەوە، ترسنۆکان هەرگیز خەو لە چاوانیان نەکەوێ. واتە: دڵگرانە لەسەر ئەوە کە لە جەنگا نەکوژراوە، داخو کەسەر هەڵدەکێشێ بۆ ئەوەو پێی ناخۆشە لەسەر جێگە دەمرێت[3].

### قەرزدان و پاداشتەکەی

خودای مەزن ئەفەرموێت: ﴿مَّن ذَا ٱلَّذِى يُقْرِضُ ٱللَّهَ قَرْضًا حَسَنًا فَيُضَـٰعِفَهُۥ لَهُۥٓ أَضْعَافًا كَثِيرَةً﴾ کێماڵی خۆی بە دەستە قەرز ئەدا بە خودا، هەتا ئەویش چەند ئەوەندەی بداتەوە؟ خودای مەزن

---

[1] آل عمران(١٦٨).
[2] النساء(٧٧-٧٨).
[3] تهذيب التهذيب(٣/١٢٤).

عەبدەكانی هەڵدەنێ بۆ ماڵ بەخشین لە ڕێی خوادا، خودای گەورە ئەم ئایەتەی چەندین جار دووبارە كردۆتەوە لە قورئانی پیرۆزدا، وە لەم فەرموودە پیرۆزەدا خودای مەزن ئەفەرموێت: (كەسێ قەرز بدا خۆی نەبوبێ‌و ستەمكاریش نەبێ)[1] خودای گەورە ئەفەرموێت: ﴿فَيُضَٰعِفَهُۥ لَهُۥٓ أَضۡعَافٗا كَثِيرَةٗ﴾ خودا بۆی زیاد دەكات بە زیادكردنێكی زۆر. وەك لە ئایەتێكی ترا ئەفەرموێت: ﴿مَّثَلُ ٱلَّذِينَ يُنفِقُونَ أَمۡوَٰلَهُمۡ فِي سَبِيلِ ٱللَّهِ كَمَثَلِ حَبَّةٍ أَنۢبَتَتۡ سَبۡعَ سَنَابِلَ فِي كُلِّ سُنۢبُلَةٖ مِّاْئَةُ حَبَّةٖۗ وَٱللَّهُ يُضَٰعِفُ لِمَن يَشَآءُ﴾[2] بەسەرهاتی ئەو كەسانەی ماڵیان لە ڕێی خودا دەبەخشن، وەك بەسەرهاتی دەنكێكە حەوت گوڵ ئەدات، هەر گوڵەو سەد دانەی تێدا بێ، خودا چەند ئەوەندە پاداش ئەداتەوە بە هەركەس بیەوێ. بەو زوانە قسەی لەسەر دەكەین. پاشان خودای گەورە ئەفەرموێت: ﴿وَٱللَّهُ يَقۡبِضُ وَيَبۡصُۜطُ وَإِلَيۡهِ تُرۡجَعُونَ﴾ كەم بژێوی‌و فراوانیش هەر بە دەس خودایە‌و هەموویش هەر دێنەوە لای ئەو لە ڕۆژی قیامەتا، واتە: ببەخشن‌و هیچ ترستان نەبێ، خودا ڕۆزی دەرەو بە ویستی خۆی دەبەخشێ بە هەركەسێ خۆی مەیلی لێ بێ‌و دەیگرێتەوە لە هەركەسیش خۆی مەیلی لێ بێ. ئەوەیش لە كارزانی خودای مەزن خۆیەتی.

﴿أَلَمۡ تَرَ إِلَى ٱلۡمَلَإِ مِنۢ بَنِيٓ إِسۡرَٰٓءِيلَ مِنۢ بَعۡدِ مُوسَىٰٓ إِذۡ قَالُواْ لِنَبِيّٖ لَّهُمُ ٱبۡعَثۡ لَنَا مَلِكٗا نُّقَٰتِلۡ فِي سَبِيلِ ٱللَّهِۖ قَالَ هَلۡ عَسَيۡتُمۡ إِن كُتِبَ عَلَيۡكُمُ ٱلۡقِتَالُ أَلَّا تُقَٰتِلُواْۖ قَالُواْ وَمَا لَنَآ أَلَّا نُقَٰتِلَ فِي سَبِيلِ ٱللَّهِ وَقَدۡ أُخۡرِجۡنَا مِن دِيَٰرِنَا وَأَبۡنَآئِنَاۖ فَلَمَّا كُتِبَ عَلَيۡهِمُ ٱلۡقِتَالُ تَوَلَّوۡاْ إِلَّا قَلِيلٗا مِّنۡهُمۡۚ وَٱللَّهُ عَلِيمُۢ بِٱلظَّٰلِمِينَ ﴿٢٤٦﴾﴾

**بەسەرهاتی جوولەكە، لە داوای سەركردەو جەنگیان كرد، كەمێكیان نەبێ لەسەر قسەی خۆیان نەمان‌و هاوكاریان نەكرد**

خودای مەزن ئەفەرموێت: ﴿أَلَمۡ تَرَ إِلَى ٱلۡمَلَإِ مِنۢ بَنِيٓ إِسۡرَٰٓءِيلَ مِنۢ بَعۡدِ مُوسَىٰٓ إِذۡ قَالُواْ لِنَبِيّٖ لَّهُمُ ٱبۡعَثۡ لَنَا مَلِكٗا نُّقَٰتِلۡ فِي سَبِيلِ ٱللَّهِۖ قَالَ هَلۡ عَسَيۡتُمۡ إِن كُتِبَ عَلَيۡكُمُ ٱلۡقِتَالُ أَلَّا تُقَٰتِلُواْ﴾ نەتزانیوە چەند كەس لە پیاو ماقوڵانی(لە نەوەی ئیسرائیل) بە پێغەمبەرەكەی خۆیان وت: سەركردەیەكمان(پاشایەكمان) بۆ دیاری بكە تا لە ڕێی خودا غەزا بكەین، دەڵێت: ئەگەر فەرمانی خوداتان بۆ دەرچێ پێتان وا نیە كە جەنگ ناكەن؟ وتیان: جا چۆن لە غەزایە(لە ڕێی خوا بێ) جەنگ

---

[1] مسلم(٧٥٨).

[2] البقرة(٢٦١).

ناكەين. موجاهید دەڵێت: ئەو پێغەمبەرە شمویل بوە(سەلامی خوای لێ بێ)[1] وەهەبی كوڕی مونەبەهو(المنَبِّه) كەسانی تریش وتیان: نەوەی ئیسرائیل دوای مووسا(سەلامی خوای لێ بێ) لەسەر راستە ڕێ بوون، بۆ ماوەیەكی زۆر، پاشان شتی تازەیان داهێناو هەندێكیان دەسیان دایە بت پەرستی، بەردەوام پێغەمبەران(سەلامی خوایان لێ بێ) لە نێوانیاندا بووە فەرمانی پێداون بە چاكەو خراپەی لێ قەدەغە كردوون‌و لەسەر ڕێبازی تەورات ڕێنمایی كردوون، هەتا ئەو كاتەی دەستیان دایە تاوان‌و لە ڕێ لادان. خودایش دوژمنی بەسەردا زاڵ كردن‌و زۆر وڵاتی لە دەستیان سەندەوە. هەركەسێ شەڕی دژیان بكردایە سەردەكەوت بە سەریاندا، چونكە ئەوان تەورات‌و ئەو تابوتەیان(التابوت) كە لە دێر زەمانەوە میراتیەك بوو كە پاشینەكانیان لە پێشینەكانیانەوە بۆیان مابوەوەو هەتا گەیشتبوە مووسا(سەلامی خوای لێ بێ) هەر لە لایان بوو، بەڵام ئەوان هەر درێژەیان دا بە گومڕایە هەتا هەندێ لە پاشاكان لە دەستیان سەندن لە هەندێ جەنگداو تەوراتیشیان هەر لە دەس وەرگرتن، ژمارەیەكی كەمیان نەبوو لەبەری نەبوو. پێغەمبەریەتی لە ناویاندا نەماو بڕا. وە هیچ كەسێ لە بنەماڵەی لاوی(لاوي) كە كوڕی یەعقوبە نەما كە پێغەمبەران لە نێوانیاندا ببێ جگە لە ژنێك كە سكی پڕ بوو بە مێردەكەیەوە كە كوژرا بوو، ئەو ژنەیان لە ماڵێكدا بەند كردبوو، پارێزگاریان لێدەكرد، سا بەڵكو خودا منداڵێكی پێ ببەخشێ‌و ببێتە پێغەمبەرێك بۆیان. بەردەوام ژنەكە لە خودای گەورە دەپاڕایەوە كە خودا منداڵێكی پێ ببەخشێ خودای مەزن قسەی بیست‌و منداڵێكی پێ بەخشی ناوی نا شمویل واتە: خودا پاڕانەوەكەی منی بیست، هەندێكیان دەڵێن: شەمعون. هەر بەو مانایە. منداڵەكە بووە لاوێك‌و لەناویاندا پێگەیشت، خودا بە چاكی پێی گەیاند. كاتێ تەمەنی گەیشتە تەمەنی پێغەمبەریەتی خودا نیگای بۆ كردو فەرمانی پێدا كە بانگی خەڵكی بكات بۆ خوا پەرستی بە تەنیا، ئەویش بانگی نەوەی ئیسرائیلی كرد، داوایان لێكرد كە پاشایەكیان بۆ دابنێ‌و لەگەڵیدا دژی دوژمن شەڕ بكەن. چونكە پاشاشیان نەمابوو. ئەو پێغەمبەرە(سەلامی خوای لێ بێ) پێی وتن: ئەگەر فەرمانی غەزاتان بۆ دەرچێ لەوانەیە لەو بەڵێنەی ئەیدەن پەشیمان ببنەوەو لەگەڵیدا شەڕ نەكەن. ﴿قَالُواْ وَمَا لَنَآ أَلَّا نُقَٰتِلَ فِي سَبِيلِ ٱللَّهِ وَقَدۡ أُخۡرِجۡنَا مِن دِيَٰرِنَا وَأَبۡنَآئِنَا﴾ وتیان: جا چۆن لە غەزا(لە ڕێی خودا) خۆ لائەدەین، كە دەشبینین ئێمەیان لە زێدی خۆمان وەدەرناوەو لە منداڵانی خۆمانیان دوور خستوینەوە؟ ﴿فَلَمَّا كُتِبَ عَلَيۡهِمُ ٱلۡقِتَالُ تَوَلَّوۡاْ إِلَّا قَلِيلٗا مِّنۡهُمۡۚ وَٱللَّهُ عَلِيمُۢ بِٱلظَّٰلِمِينَ﴾ كاتێ بڕیاریان بۆ درا بچنە غەزا،

[1] الطبري(٥/٢٩٣).

پشتیان تێکردو ڕایان کرد هەر کەمێکیان مابونەوە، خوا ستەمکاران باش دەناسێ. واتە: ئەو بەڵێنەی دابویان نەیان بردە سەرو زۆربەیان لە غەزا شاردەوەو ڕایان کرد. خودا باشیان دەناسێ.

﴿ وَقَالَ لَهُمْ نَبِيُّهُمْ إِنَّ اللَّهَ قَدْ بَعَثَ لَكُمْ طَالُوتَ مَلِكًا قَالُوا أَنَّى يَكُونُ لَهُ الْمُلْكُ عَلَيْنَا وَنَحْنُ أَحَقُّ بِالْمُلْكِ مِنْهُ وَلَمْ يُؤْتَ سَعَةً مِنَ الْمَالِ قَالَ إِنَّ اللَّهَ اصْطَفَاهُ عَلَيْكُمْ وَزَادَهُ بَسْطَةً فِي الْعِلْمِ وَالْجِسْمِ وَاللَّهُ يُؤْتِي مُلْكَهُ مَنْ يَشَاءُ وَاللَّهُ وَاسِعٌ عَلِيمٌ (٢٤٧) ﴾

خودای مەزن ئەفەرموێت: ﴿وَقَالَ لَهُمْ نَبِيُّهُمْ إِنَّ اللَّهَ قَدْ بَعَثَ لَكُمْ طَالُوتَ مَلِكًا﴾ پێغەمبەرەکەیان پێی وتن: خودا بۆ پاشایەتیتان تالووتی دیاری کردوە. واتە: کاتێ کە داوایان کرد لە پێغەمبەرەکەیان کە پادشایەکیان بۆ دیاری بکات، ئەویش تالووتی بۆ دیاری کردن، پیاوێك بوو لەناو خۆیاندا، بەڵام لە بنەماڵەی ئەودا لە پێشا پادشا نەبوو. چونکە پاشایەتی لە نێوانیادا لە وەچەی یەهوزا بووە. تالووت لەو بنەماڵەیە نەبوو. خودای مەزن ئەفەرموێت: ﴿قَالُوا أَنَّى يَكُونُ لَهُ الْمُلْكُ عَلَيْنَا وَنَحْنُ أَحَقُّ بِالْمُلْكِ مِنْهُ وَلَمْ يُؤْتَ سَعَةً مِنَ الْمَالِ﴾ بۆیە وتیان: کوا ئەو شایەنی ئەم فەرمانەیە؟ کە ئێمە زۆر لەو شیاوترو بە دارایی ترین. هەندێ وتویانە: تالووت ئاوگێڕ بووە، وتراویشە: پێسەی خۆش کردوە. ئەمە ڕەخنە گرتن‌و لاساری بووە دەربارەی پێغەمبەرەکەیان. ئەوە چاکتر بوو بۆ ئەوان کە گوێڕایەڵی بونایەو قسەی چاکیان بکردایە. پاشان پێغەمبەرەکەیان وەڵامی دانەوە ﴿قَالَ إِنَّ اللَّهَ اصْطَفَاهُ عَلَيْكُمْ﴾ دەڵێت: خودا ئەوەی کردۆتە فەرماندە، واتە: لەناو ئێوەدا ئەوی هەڵبژاردوە، خودا لە ئێوە باشتر دەزانێ لە خۆتان، دەڵێت: من دام نەناوە بەسەرتانەوە ببێتە فەرماندە لە خۆمەوە، بەڵکو خودا فەرمانی پێداوم کاتێ کە ئێوە داواتان لێکردم لەو بارەیەوە ﴿وَزَادَهُ بَسْطَةً فِي الْعِلْمِ وَالْجِسْمِ﴾ زانست‌و قەلافەتیشی لە ئێوە چاکترە. واتە: تالووت زۆر لە ئێوە شارەزا ترو بەژن‌و باڵا چاکترو ئازاو خۆڕاگریشە لە جەنگدا. بۆیە دەبێ فەرماندە زۆر شارەزاو بەتواناو ئازا بێ، خاوەن قیافەتێکی چاك‌و بەهێز بێ. ﴿وَاللَّهُ يُؤْتِي مُلْكَهُ مَنْ يَشَاءُ﴾ خودا بیەوێ پاشایەتی بە هەرکەسێ بدا دەیدا. واتە: خودا ئەو فەرمانڕەوایە هەرچی ویستی لێ بێ دەیکا. لەوەی دەیکا پرسیاری لێ ناکرێ، ئەوان لێپرسینەوەیان لێ دەکرێ. لەبەر زانیاری‌و لە کارزانی‌و بەزەیی خودا دەربارەی عەبدەکانی. هەربۆیەئەفەرموێت: ﴿وَاللَّهُ وَاسِعٌ عَلِيمٌ﴾ زانستی خودا بەربڵاوەو لە هەموو شت ئاگادارە. واتە: خودا چاکەی زۆر فراوانەو مەیلی لەسەر کەسێ ببێ بەر بەزەیی خۆی دەخات‌و دەزانێ کێ شایەنی فەرمانڕەوایی‌و پاشایەتیەو کێش شایەنی نیە.

﴿وَقَالَ لَهُمْ نَبِيُّهُمْ إِنَّ ءَايَةَ مُلْكِهِۦٓ أَن يَأْتِيَكُمُ ٱلتَّابُوتُ فِيهِ سَكِينَةٌ مِّن رَّبِّكُمْ وَبَقِيَّةٌ مِّمَّا تَرَكَ ءَالُ مُوسَىٰ وَءَالُ هَٰرُونَ تَحْمِلُهُ ٱلْمَلَٰٓئِكَةُ ۚ إِنَّ فِى ذَٰلِكَ لَءَايَةً لَّكُمْ إِن كُنتُم مُّؤْمِنِينَ ﴿٢٤٨﴾﴾

خودای مەزن ئەفەرمویّت: ﴿وَقَالَ لَهُمْ نَبِيُّهُمْ إِنَّ ءَايَةَ مُلْكِهِۦٓ أَن يَأْتِيَكُمُ ٱلتَّابُوتُ فِيهِ سَكِينَةٌ﴾ پێغەمبەرەکەیان پێی وتن: دروشمی پاشایەتی ئەو لە لایەن پەروەردگارتانەوەیە، تابووتێکە دڵنیا بوونی تێدایە. واتە: پێغەمبەرەکەیان پێی وتن: دروشمی بەرەکەتی پاشایەتی تالووت بەسەرتانەوە ئەو تابووتەیە کە خودای مەزن لە پێشا لێی سەندبونەوە ئێستا بۆتان دەگێڕێتەوە. کە دڵنیاییو ڕێزە لە لایەن پەروەردگارتانەوە. عەبدوڕەزاق دەڵێت لە موعەمەرەوە، لە قەتادەوە ﴿فِيهِ سَكِينَةٌ﴾ واتە: شکۆمەندی تێدایە بۆتان[1]. ڕەبیع دەڵێت: بەزەییە بۆتان لە لایەن خوداوە، عەوفیش هەر وا ڕیوایەتی کردوە لە ئیبنوعەبباسەوە. ﴿وَبَقِيَّةٌ مِّمَّا تَرَكَ ءَالُ مُوسَىٰ وَءَالُ هَٰرُونَ﴾ لەگەڵ هەندێك کەلەپوری خانەدانی مووساو هارون. ئیبنوجەریر ڕیوایەتی کردوە لە ئیبنوعەبباسەوە لەم ئایەتەدا ﴿وَبَقِيَّةٌ مِّمَّا تَرَكَ ءَالُ مُوسَىٰ وَءَالُ هَٰرُونَ﴾ لەگەڵ هەندێ کەلەپوری خانەوادەی مووساو هارون. دەڵێت: عەساکەی مووساو هەندێ پارچەی لەوحەکان(الالواح)[2] قەتادەو سوودیو ڕەبیعی کوڕی ئەنەسو عیکرمەش هەر وایان وتوە. بەڵام وتەی تەوراتیان بۆ زیاد کردوە.[3] عەبدوڕەزاق دەڵێت: پرسیارم کرد لە سەوری دەربارەی ئەم ئایەتە: ﴿وَبَقِيَّةٌ مِّمَّا تَرَكَ ءَالُ مُوسَىٰ وَءَالُ هَٰرُونَ﴾ لەگەڵ هەندێك کەلەپوری خانەدانی مووساو هارون. دەڵێت: هەندێ دەڵێن: تەفیزێك گەزۆو هەندێ پارچەی ئەلواحەکان. هەندێکی تریش دەڵێن: عەساکەیو دوو نەعل[4]. ﴿تَحْمِلُهُ ٱلْمَلَٰٓئِكَةُ﴾ فریشتە هەڵیان گرتوە. ئیبنوجورەیج دەڵێت: ئیبنوعەبباس دەڵێت: فریشتە هاتنو تابووتەکەیان هەڵگرتبوو هێنایان لەبەر دەستی تالووتدا دایان نا خەڵکی سەیریان دەکرد[5] سوودی

[1] عبدالرزاق(١/٩٨).

[2] الطبري(٥/٣٣١).

[3] الطبري(٥/٣٣١-٣٣٢).

[4] الطبري(٥/٣٣٣).

[5] الطبري(٥/٣٣٥).

دەڵێت: تابووتەکە لە ماڵی تالووت دانراو بڕوایان بە پێغەمبەریەتی شەمعون هێناو گوێڕایەڵی تالووتیان کرد[1] ﴿إِنَّ فِي ذَٰلِكَ لَآيَةً لَّكُمْ إِن كُنتُم مُّؤْمِنِينَ﴾ ئەمە بەڵگەیە بۆ ئێوە ئەگەر بڕواتان بە خوا هەیە. لەسەر ڕاستی ئەوە کە لەلایەن خوداوە پێی هاتووم‌و فەرمانتان پێدەکەم کە گوێڕایەڵی تالووت بکەن، ئەگەر بڕواتان بە خوا هەیە.

﴿فَلَمَّا فَصَلَ طَالُوتُ بِالْجُنُودِ قَالَ إِنَّ اللَّهَ مُبْتَلِيكُم بِنَهَرٍ فَمَن شَرِبَ مِنْهُ فَلَيْسَ مِنِّي وَمَن لَّمْ يَطْعَمْهُ فَإِنَّهُ مِنِّي إِلَّا مَنِ اغْتَرَفَ غُرْفَةً بِيَدِهِ ۚ فَشَرِبُوا مِنْهُ إِلَّا قَلِيلًا مِّنْهُمْ ۚ فَلَمَّا جَاوَزَهُ هُوَ وَالَّذِينَ آمَنُوا مَعَهُ قَالُوا لَا طَاقَةَ لَنَا الْيَوْمَ بِجَالُوتَ وَجُنُودِهِ ۚ قَالَ الَّذِينَ يَظُنُّونَ أَنَّهُم مُّلَاقُو اللَّهِ كَم مِّن فِئَةٍ قَلِيلَةٍ غَلَبَتْ فِئَةً كَثِيرَةً بِإِذْنِ اللَّهِ ۗ وَاللَّهُ مَعَ الصَّابِرِينَ ﴿٢٤٩﴾﴾

خودای مەزن ئەفەرموێت: ﴿فَلَمَّا فَصَلَ طَالُوتُ بِالْجُنُودِ قَالَ إِنَّ اللَّهَ مُبْتَلِيكُم بِنَهَرٍ﴾ کاتێ تالووت لەشکرەکەی خستە سەر ڕێ، دەڵێت: خودا بە جۆبارێك دەیەوێ تاقیتان بکاتەوە. خودای گەورە لێرەداباسی پاشای نەوەی ئیسرائیل دەکات کە تالووتە، کاتێ بە لەشکرەکەیەوە کەوتە ڕێ لەگەڵ ئەو پیاوماقوڵانەی کە گوێڕایەڵیان کرد لە نەوەی ئیسرائیل. سووپاکەی لەو کاتەدا وەك سوودی باسی کردوە هەشتا هەزار کەس بووە[2] والله أعلم. ﴿قَالَ إِنَّ اللَّهَ مُبْتَلِيكُم بِنَهَرٍ﴾ خودا تاقیتان دەکاتەوە بە ڕووبارێك، ئیبنوعەبباس‌و کەسانی تریش وتویانە: ئەو ڕووبارە لە نێوان ئەردەن‌و فەلەستین دایە[3] واتە ڕووباری شەریعەی(الشريعة) بەناوبانگە ﴿فَمَن شَرِبَ مِنْهُ فَلَيْسَ مِنِّي وَمَن لَّمْ يَطْعَمْهُ فَإِنَّهُ مِنِّي﴾ هەرکەسێ لێی بخواتەوە لە من نیە، هەرکەسێ لێی نەچەشت سەر بە منە. واتە: هەرکەسێ لێی خواردەوە ئەمڕۆ لەگەڵ منا نەیەت. ﴿إِلَّا مَنِ اغْتَرَفَ غُرْفَةً﴾ مەگین کەسێك بە لامشت لێی هەنگۆزێ‌و بیخواتەوە ئەوەی قەیدی نیە. خودای مەزن ئەفەرموێت: ﴿فَشَرِبُوا مِنْهُ إِلَّا قَلِيلًا مِّنْهُمْ﴾ کەمێکیان نەبێ هەموویان لێیان خواردەوە. ئیبنوجورەیج دەڵێت: لە ئیبنوعەبباسەوە: هەرکەسێ بە لا مشت لێی خواردەوە تینویەتی شکا، ئەوەیش بە تەواوی خواردیەوە تینویەتی نەشکا.[4] ئیبنوجەریر ڕیوایەتی کردوە لە بەرائی کوڕی عازیبەوە، دەڵێت: ئێمە باسی هاوەڵەکانی

---

[1] الطبري(٥/٣٣٥).

[2] الطبري(٥/٣٣٩).

[3] الطبري(٥/٣٤٠).

[4] الطبري(٥/٣٤٥).

پێغەمبەرمان(ﷺ) دەکرد کە لە ڕۆژی بەدرا لە سێ سەدو دە کەس بەرەو ژوورتر بوون، کە ئەوەندەی ژمارەی هاوەڵەکانی تالووت بوو کە لە ڕووبارەکە لەگەڵیدا پەڕینەوە. جگە لە خاوەن باوەڕەکان لەگەڵی نەپەڕینەوە[1] بوخاریش هەر بەو جۆرە ڕیوایەتی کردوە[2] هەر بۆیە خودای گەورە ئەفەرموێت: ﴿فَلَمَّا جَاوَزَهُۥ هُوَ وَٱلَّذِينَ ءَامَنُوا۟ مَعَهُۥ قَالُوا۟ لَا طَاقَةَ لَنَا ٱلْيَوْمَ بِجَالُوتَ وَجُنُودِهِۦ﴾ کاتێ خۆیو خاوەن باوەڕانی هاوەڵی لەگەڵی پەڕینەوە. وتیان: ئەمڕۆ لە وزەی ئێمەدا نیە بەرانبەر بە جالووتو لەشکرەکەی بوەستین. دەترسان لەوە کە ڕووبەڕووی دوژمن ببنەوە، ژونکە دوژمن ژمارەیان زۆر بوو، زاناکانیان هەڵیان دەنان بەوە کە بەڵێنی خودا ڕاستەو سەرکەوتنیش بە دەس خودایە، بە زۆری ژمارەوچەکو کەرەسەی جەنگی نیە. هەربۆیەخودای مەزن ئەفەرموێت: ﴿قَالَ ٱلَّذِينَ يَظُنُّونَ أَنَّهُم مُّلَـٰقُوا۟ ٱللَّهِ كَم مِّن فِئَةٍ قَلِيلَةٍ غَلَبَتْ فِئَةً كَثِيرَةًۢ بِإِذْنِ ٱللَّهِ ۗ وَٱللَّهُ مَعَ ٱلصَّـٰبِرِينَ﴾ ئەو کەسانەی بە هیوا بوون بە دیداری خودا بگەن، وتیان: کۆمەڵێ کەم(بە ئیزنی خودا) بەسەر کۆمەڵێکی زۆردا سەرکەوتوون. خودا لەگەڵ خۆڕاگرانە.

﴿وَلَمَّا بَرَزُوا۟ لِجَالُوتَ وَجُنُودِهِۦ قَالُوا۟ رَبَّنَآ أَفْرِغْ عَلَيْنَا صَبْرًا وَثَبِّتْ أَقْدَامَنَا وَٱنصُرْنَا عَلَى ٱلْقَوْمِ ٱلْكَـٰفِرِينَ ﴿٢٥٠﴾ فَهَزَمُوهُم بِإِذْنِ ٱللَّهِ وَقَتَلَ دَاوُۥدُ جَالُوتَ وَءَاتَىٰهُ ٱللَّهُ ٱلْمُلْكَ وَٱلْحِكْمَةَ وَعَلَّمَهُۥ مِمَّا يَشَآءُ ۗ وَلَوْلَا دَفْعُ ٱللَّهِ ٱلنَّاسَ بَعْضَهُم بِبَعْضٍ لَّفَسَدَتِ ٱلْأَرْضُ وَلَـٰكِنَّ ٱللَّهَ ذُو فَضْلٍ عَلَى ٱلْعَـٰلَمِينَ ﴿٢٥١﴾ تِلْكَ ءَايَـٰتُ ٱللَّهِ نَتْلُوهَا عَلَيْكَ بِٱلْحَقِّ ۚ وَإِنَّكَ لَمِنَ ٱلْمُرْسَلِينَ ﴿٢٥٢﴾﴾

خودای مەزن ئەفەرموێت: ﴿وَلَمَّا بَرَزُوا۟ لِجَالُوتَ وَجُنُودِهِۦ قَالُوا۟ رَبَّنَآ أَفْرِغْ عَلَيْنَا صَبْرًا وَثَبِّتْ أَقْدَامَنَا وَٱنصُرْنَا عَلَى ٱلْقَوْمِ ٱلْكَـٰفِرِينَ﴾ کاتێك لەگەڵ جالووتو لەشکرەکەی تووشی یەك بوون، وتیان: ئەی پەروەردگارمان خۆڕاگرمان بکەو لە مەیداندا پێکانمان جێگیر کە، سەرمانخە بەسەر کەسانی خوانەناساندا. واتە: کاتێ کە کۆمەڵی خواناسان کە ژمارەیەکی کەم بوون لە هاوەڵەکانی تالووت ڕووبەڕووی دوژمنەکانیان بوونەوە لە دارو دەستەی جالووت، وتیان خودایە خۆڕاگرمان کە بەرانبەر دوژمنمانو وامان لێ بکە لە جەنگدا ڕانەکەینو ڕاوەستاو بینو سەرمان بخە بەسەر خوانەناساندا. خودای گەورە ئەفەرموێت: ﴿فَهَزَمُوهُم بِإِذْنِ ٱللَّهِ﴾ ئەوسا بە ئیزنی خودا

---

[1] الطبري(٥/٣٤٦-٣٤٧).

[2] فتح الباري(٧/٣٣٩).

شکاندنیان‌و سەرکەوتن بەسەریاندا ﴿وَقَتَلَ دَاوُۥدُ جَالُوتَ﴾ داوود جالووتی کوشت. لە ئیسرائیلیاتدا هاتوە کە بە قۆچەقانیەوە بە دەستیەوە بووە داوود جالووتی کوشتوە. تێی گرتوە پێی کوشتویەتی، تالووت بەڵێنی پێدا بوو ئەگەر جالووتی کوشت کچەکەی خۆی بکاتە هاوسەری‌و لەو شتانەی هەیەتی بەشی بداو بیکاتە هاوکاری خۆی بەڵێنی خۆشی بردە سەرو پاشان پاشایەتیەکەی خۆی سپاردە داوود لەگەڵ ئەو پێغەمبەریەتیە مەزنەشی خودا پێی بەخشی. هەر بۆیە خودای مەزن ئەفەرموێت: ﴿وَءَاتَىٰهُ ٱللَّهُ ٱلْمُلْكَ وَٱلْحِكْمَةَ﴾ خودا پاشایەتی‌و لەکارزانی پێدا، واتە: ئەو پاشایەتیەی پێدا کە لە دەست تالووتدا بوو لەگەڵ پێغەمبەریشا دوای شمویل(سەلامی خوایان لێ بێ). ﴿وَعَلَّمَهُۥ مِمَّا يَشَآءُ﴾ هەرچی بۆ خۆی پێویستی پێی بوو فێری کرد. پاشان خودای مەزن ئەفەرموێت: ﴿وَلَوْلَا دَفْعُ ٱللَّهِ ٱلنَّاسَ بَعْضَهُم بِبَعْضٍ لَّفَسَدَتِ ٱلْأَرْضُ﴾ ئەگەر خودا خەڵکی لەناو نەبرایە هەندێکی بە هەندێکی هەموو زەوی پڕ دەبوو لە خراپەو تاوان، وەك چۆن خودا یارمەتی تالووتی دا بە ڕوویەڕووبونەوەی جالووت‌و ئازایەتی داوود هەموو لەناودەچوون. وەك خودای گەورە لە ئایەتێکی ترا ئەفەرموێت: ﴿وَلَوْلَا دَفْعُ ٱللَّهِ ٱلنَّاسَ بَعْضَهُم بِبَعْضٍ لَّهُدِّمَتْ صَوَٰمِعُ وَبِيَعٌ وَصَلَوَٰتٌ وَمَسَٰجِدُ يُذْكَرُ فِيهَا ٱسْمُ ٱللَّهِ كَثِيرًا﴾[1] ئەگەر خودا هەندێکیان بە هەندێکیان ڕاونەنایە دێرو کلیسەو کەنشت‌و مزگەوتەکان(کە لە ناویاندا زۆر ناوی خودا دەبرێ) وێران دەکران. پاشان خودای مەزن ئەفەرموێت: ﴿وَلَٰكِنَّ ٱللَّهَ ذُو فَضْلٍ عَلَى ٱلْعَٰلَمِينَ﴾ بەڵام خودا چاکەی لەسەر هەموو خەڵکی دنیا هەیە. واتە: خوا منەت دەکات بەسەر عەبدەکانیاو بەزەیی دێتەوە پێیاندا هەندێکی بە هەندێکی بەرکەنار دەخات، خودای گەورە هەموو کارێکی پڕ لە کارزانیە بەرانبەر بە عەبدەکانی. پاشان ئەفەرموێت: ﴿ تِلْكَ ءَايَٰتُ ٱللَّهِ نَتْلُوهَا عَلَيْكَ بِٱلْحَقِّ ۚ وَإِنَّكَ لَمِنَ ٱلْمُرْسَلِينَ﴾ ئەمانە نیشانەی خودان کە بەڕاستی هەر بۆ تۆی دەخوێنینەوە کە بێگومان یەکێك لە پێغەمبەرانی. ئەمانە بەڵگەو نیشانەی خودان کە بۆ تۆمان باس کرد دەربارەی ئەمانەو بە ڕاستی بۆمان گێڕاوتەوە، کە هیچ جیاوازیەکی تێدا نیە لەگەڵ ئەوەدا کە لەبەر دەستی ئەهلی کتێبدایەو کە زانایانی ئەهلی کتێب دەیزانن‌و شارەزاین ﴿وَإِنَّكَ﴾ تۆ ئەی موحەممەد(ﷺ) ﴿لَمِنَ ٱلْمُرْسَلِينَ﴾ یەکێکی لە پێغەمبەران. ئەمە جەخت کردنەوەیە لەسەر سوێند.

---

[1] الحج(٤٠).

﴿تِلْكَ ٱلرُّسُلُ فَضَّلْنَا بَعْضَهُمْ عَلَىٰ بَعْضٍ مِّنْهُم مَّن كَلَّمَ ٱللَّهُ وَرَفَعَ بَعْضَهُمْ دَرَجَٰتٍ وَءَاتَيْنَا عِيسَى ٱبْنَ مَرْيَمَ ٱلْبَيِّنَٰتِ وَأَيَّدْنَٰهُ بِرُوحِ ٱلْقُدُسِ وَلَوْ شَآءَ ٱللَّهُ مَا ٱقْتَتَلَ ٱلَّذِينَ مِنۢ بَعْدِهِم مِّنۢ بَعْدِ مَا جَآءَتْهُمُ ٱلْبَيِّنَٰتُ وَلَٰكِنِ ٱخْتَلَفُوا۟ فَمِنْهُم مَّنْ ءَامَنَ وَمِنْهُم مَّن كَفَرَ وَلَوْ شَآءَ ٱللَّهُ مَا ٱقْتَتَلُوا۟ وَلَٰكِنَّ ٱللَّهَ يَفْعَلُ مَا يُرِيدُ (٢٥٣)﴾

## ڕێزی هەندێ لە پێغەمبەران لەسەر هەندێکی تریان

خوداباسی فەزڵی هەندێ لە پێغەمبەرانی کردوە بەسەر هەندێکی تریانەوە وەك ئەفەرمووێت: ﴿وَلَقَدْ فَضَّلْنَا بَعْضَ ٱلنَّبِيِّـۧنَ عَلَىٰ بَعْضٍ وَءَاتَيْنَا دَاوُۥدَ زَبُورًا﴾[1] لەناو پێغەمبەرەکانیش فەزڵی هەندێکمان دا بەسەر هەندێکی تردا، زەبوریشمان دا بە داوود. لێرەیشدا ئەفەرمووێت: ﴿تِلْكَ ٱلرُّسُلُ فَضَّلْنَا بَعْضَهُمْ عَلَىٰ بَعْضٍ مِّنْهُم مَّن كَلَّمَ ٱللَّهُ﴾ لەناو ئەو پێغەمبەرانەدا فەزڵی هەندێکیانمان دا بەسەر هەندێکی تردا. جا لەناویاندا هی وا هەبووە کە خودا ئەوی دواندووە.وەك : (مووساو موحەممەدو (صلی الله علیهما وسلم) ئادەم (سڵاوی خوایان لێ بێ) )یش وەك ئەم فەرموودەیە کە لە سەحیحی ئیبنوحیباندا لە ئەبوزەڕەوە (ڕەزای خوای لێ بێ) ڕیوایەت کراوە: ﴿وَرَفَعَ بَعْضَهُمْ دَرَجَٰتٍ﴾ پلەو پایەی هەندێکیشی بەرز کردۆتەوە. وەك لە فەرموودەکەی شەوڕەویدا (الاسراء) هاتووە، پێغەمبەر(ﷺ)لە ئاسمانەکاندا پێغەمبەرانی بینی (سەلامی خوایان لێ بێ) هەرکەسەو بەپێی پلەو پایەی خۆی لەلای خودای مەزن. خۆ ئەگەر (بوترێ) ئەی چۆن ئەم ئایەتەو ئەم فەرموودەیە یەك دەکەون کە لە هەردوو سەحیحەکەدا هاتووە لە ئەبوهورەیرەوە: پیاوێك موسڵمانێك و جوولەکەیەك بوو بەدەمەقاڵێیان بوو، جوولەکەکە سوێندی خوارد: نەخێر سوێند بەو کەسەی موسای هەڵبژاردووە بەسەر هەموو خەڵکی دنیادا، موسوڵمانەکە دەستی بەرزکردەوەو زلەیەکی لە جوولەکەکەدا، وتی: ئەی پیسی نەگریس لەسەر موحەممەدیش(ﷺ)؟ جوولەکەکە هات بۆ لای پێغەمبەرو (ﷺ) سکاڵای کرد، پێغەمبەری خودا (ﷺ) فەرمووی: (ڕێزم مەدەن بەسەر پێغەمبەراندا (سەلامی خوایان لێ بێ) بێگومان هەموو خەڵکی لە ڕۆژی قیامەتدا لە هۆش خۆیان دەچن و دەمرن ، من یەکەم کەس دەبم کە زیندوو دەکرێمەوە، دەبینم موسا دەستی گرتوە بە عەرشەوە، من نازانم پێش من زیندوو کراوەتەوە یان پاداشتی دراوەتەوە بەهۆی بێهۆش بوونیەوە لەکێوی تورا (الطور)؟ ڕێزم مەدەن بەسەر پێغەمبەراندا)[2] لە ڕیوایەتێکی تریشدا هاتووە: (لە نێوان پێغەمبەراندا کەسیان لە کەسیان بە چاکتر مەزانن).[3] وەڵام بۆ ئەمە ئەوەیە،

---

[1] الاسراء (٥٥).

[2] فتح الباري (٥٠٨/٦)، مسلم (٤٣/٤).

[3] فتح الباري (٥١٩/٦)، مسلم (٤٣/٥).

ئەم جیاوازی خستنە لەم حاڵەتەدا کە دوو کەس مشتومڕیانەو هێنراونەتە بەر لێپرسینەوە، پەیوەندی بە ئەوانەوە نیە، بەڵکو هەر بۆ خودایەو لەلای خودایە، پێویستە ملکەچ‌و گوێڕایەڵی ئەو بنو بڕواتان بەو ببێ. ﴿وَءَاتَيْنَا عِيسَى ٱبْنَ مَرْيَمَ ٱلْبَيِّنَٰتِ﴾: چەند نیشانەمان بە عیسای کوڕی مەریەم بەخشی. واتە: بەڵگەو نیشانەی بەهێزمان بە عیسای کوڕی مەریەم لەسەر ڕاستی ئەوەی کە نەوەی ئیسرائیل پێی هاتووە لەلایەن خوداوە کە بەندەی خودایەو نێرراوی ئەوە بۆیان. ﴿وَأَيَّدْنَٰهُ بِرُوحِ ٱلْقُدُسِ﴾ وە بە گیانی پیرۆزی خۆمان پشتیوانیمان لێکرد. واتە: خودا بە جوبرەئیل(سەلامی خوای لێ بێ)پشتیوانی لێکرد پاشان خودای گەورە دەفەرمووێت: ﴿وَلَوْ شَآءَ ٱللَّهُ مَا ٱقْتَتَلَ ٱلَّذِينَ مِنۢ بَعْدِهِم مِّنۢ بَعْدِ مَا جَآءَتْهُمُ ٱلْبَيِّنَٰتُ وَلَٰكِنِ ٱخْتَلَفُوا۟ فَمِنْهُم مَّنْ ءَامَنَ وَمِنْهُم مَّن كَفَرَ ۚ وَلَوْ شَآءَ ٱللَّهُ مَا ٱقْتَتَلُوا۟﴾ ئەم خەڵکانە لە دوای ئەمەی ئەم هەموو پێغەمبەرانە هاتن، سەرەڕای ئەو نیشانانەی بۆ ئەوان هات (ئەگەر خودا بیویستایە) شەڕی یەکتریان نەدەکرد بەڵام ئەوان لە ناو خۆیاندا پێك نەهاتن، هەندێك بوونە خاوەن باوەڕو هەندێکی تر کەوتنە سەرباری خوانەناسی، ئەگەر خودا بیویستایە نەیدەهێشت بەگژیەکا بچن. بێگومان هەمانە هەموو بە بڕیارو فەرمانی خودایە. بۆیە خودای گەورە دەفەرمووێت: ﴿وَلَٰكِنَّ ٱللَّهَ يَفْعَلُ مَا يُرِيدُ﴾ بەڵام خودا بە ویستی خۆی کارەکان دەکات.

﴿ يَٰٓأَيُّهَا ٱلَّذِينَ ءَامَنُوٓا۟ أَنفِقُوا۟ مِمَّا رَزَقْنَٰكُم مِّن قَبْلِ أَن يَأْتِىَ يَوْمٌ لَّا بَيْعٌ فِيهِ وَلَا خُلَّةٌ وَلَا شَفَٰعَةٌ ۗ وَٱلْكَٰفِرُونَ هُمُ ٱلظَّٰلِمُونَ ﴿٢٥٤﴾ ﴾

﴿ يَٰٓأَيُّهَا ٱلَّذِينَ ءَامَنُوٓا۟ أَنفِقُوا۟ مِمَّا رَزَقْنَٰكُم ﴾ ئەی ئەو کەسانەی کە باوەڕتان هێناوە، لەو بژێویەی کە پێم داون ببەخشن. خودای گەورە فەرمان دەکات بە بەندەکانی کە ماڵ خەرج بکەن لە ڕێی خواداو لە ڕێی چاکەدا هەتا بیکەنە توێشو لەلای پەروەردگاریان پەلە بکەن‌و خۆ ماندو بکەن لەم ژیانەی دنیادا بۆ بەخشندەیی ﴿مِّن قَبْلِ أَن يَأْتِىَ يَوْمٌ لَّا بَيْعٌ فِيهِ وَلَا خُلَّةٌ وَلَا شَفَٰعَةٌ﴾ پێش ئەوەی ئەو ڕۆژە بێت کە نە مامەڵەو سەوداکردن دەمێنێ‌و نە تکاو نە دۆستایەتی. واتە: لە ڕۆژی قیامەتدا هیچ شتێ فریای کەس ناکەوێ، با پڕبە زەوی ئاڵتونیشی هەبێ و ببیەخشێ، سوودی نیە. دۆستایەتی‌و ڕەچەڵەك‌و بنەماڵەش بەهانای کەس نایەت. وەك خودای مەزن دەفەرمووێت: ﴿ فَإِذَا نُفِخَ فِى ٱلصُّورِ فَلَآ أَنسَابَ بَيْنَهُمْ يَوْمَئِذٍ وَلَا يَتَسَآءَلُونَ ﴾[1] هەر کاتێکیش فوو بە کەڵە شاخا کرا، نە خزمایەتی لەنێواندا

---

[1] المؤمنون (١٠١).

دەمێنێ‌و نە کەسیان لە کەس دەپرسێ. تکای تکاکارانیش هیچ بەهرەیەکی نیە. ﴿وَٱلْكَـٰفِرُونَ هُمُ ٱلظَّـٰلِمُونَ﴾ کافرانن ستەم لە خۆیان دەکەن. هیچ ستەمکارێ لەوە ستەمکارتر نیە لەو ڕۆژەدا بێتە بەردەم خودای گەورە بەبێباوەڕی. (ئیبنوئەبی حاتەم) لە عەتای کوڕی دینارەوە ڕیوایەتی کردوە: سوپاس‌و ستایش بۆ ئەو خوایەی کە فەرموویەتی: ﴿وَٱلْكَـٰفِرُونَ هُمُ ٱلظَّـٰلِمُونَ﴾ خوانەناسان ستەم لە خۆیان دەکەن، نەی فەرموە: ستەمکاران خوانەناسن[1].

﴿ٱللَّهُ لَآ إِلَـٰهَ إِلَّا هُوَ ٱلْحَىُّ ٱلْقَيُّومُ ۚ لَا تَأْخُذُهُۥ سِنَةٌ وَلَا نَوْمٌ ۚ لَّهُۥ مَا فِى ٱلسَّمَـٰوَٰتِ وَمَا فِى ٱلْأَرْضِ ۗ مَن ذَا ٱلَّذِى يَشْفَعُ عِندَهُۥٓ إِلَّا بِإِذْنِهِۦ ۚ يَعْلَمُ مَا بَيْنَ أَيْدِيهِمْ وَمَا خَلْفَهُمْ ۖ وَلَا يُحِيطُونَ بِشَىْءٍ مِّنْ عِلْمِهِۦٓ إِلَّا بِمَا شَآءَ ۚ وَسِعَ كُرْسِيُّهُ ٱلسَّمَـٰوَٰتِ وَٱلْأَرْضَ ۖ وَلَا يَـُٔودُهُۥ حِفْظُهُمَا ۚ وَهُوَ ٱلْعَلِىُّ ٱلْعَظِيمُ ﴿٢٥٥﴾﴾

## ڕێزی ئایەتەلکورسی (ئاية الكرسي)

ئەم ئایەتەلکورسیە، ڕێزێکی ئێجگار مەزنی هەیە، فەرمودەی (سەحیح) لە پێغەمبەری خوداوە هاتووە کە ئایەتەلکورسی بەڕێزترین ئایەتە لە قورئاندا، ئیمامی ئەحمەد لە ئوبەی کوڕی کەعبەوە ڕیوایەتی کردوە: کە پێغەمبەری خودا پرسیاری لێ کردوە کە (چ ئایەتێك لە قورئاندا گەورەترە؟) وتی: خوداو پێغەمبەرەکەی باشتر دەزانن، چەند جارێ دووبارەی کردەوە، ئوبەی وتی: ئایەتەلکورسی پێغەمبەر (ﷺ) فەرمووی: (زانستت لێ پیرۆز بێ ئەی ئەبومونزیر، سوێند بەو کەسەی گیانی منی بە دەستە، زمانێك دوو لێوی هەیەو باسی پاك‌و بێ عەیبی خودا دەکات لەلای ((ساقی) عەرش)).[2] موسلیمیش ڕیوایەتی کردوە[3] ئەم زیادەیەی لەگەڵ نیە (سوێند بەو کەسەی گیانی منی بەدەستە، هەتا دوایەکەی)هەروەها ئیمامی ئەحمەد لە ئەبوئەیوبەوە ڕیوایەتی کردووە کە شوێنێکی هەبو (سُهْوة) خورمای تیا دادەنا، جنۆکەیەك بۆی دەهات‌و لێی ئەبرد، لە لای پێغەمبەر (ﷺ) سکاڵای لێکرد. پێغەمبەر (ﷺ) فەرمووی: (کاتێ کە چاوت پێی کەوت پێی بڵێ: بسم الله، وەڵامی پێغەمبەری خودا (ﷺ) بدەرەوە) وتی: هات‌و پێی ووت‌و گرتی، جنۆکەکە وتی: ئیتر نایەمەوە، بەرەڵای کرد، هات‌و پێغەمبەر (ﷺ) پێی وت: (دیلەکەت چی بەسەر هات؟) وتی: گرتم، پێی وتم: ئیتر ناگەڕێمەوە، بەرەڵام کرد، فەرمووی: بێگومان دەگەڕێتەوە، دووجار یان سێ جار گرتم، هەموو جارێ دەیوت: ئیتر ناگەڕێمەوە، دەهاتم بۆ لای پێغەمبەر (ﷺ) ئەیفەرموو: (دیلەکەت چی بەسەر هات) منیش ئەموت:

---

[1] إبن أبي حاتم غ: (٣/٩٦٦).

[2] أحمد (٥/١٤١).

[3] مسلم (١/٥٥٦).

کرتم‌و ئەیوت: ئیتر ناگەڕێمەوە. ئەویش ئەیفەرموو: (بێگومان ئەو ئەگەڕێتەوە) دیسان گرتمەوەو وتی: بەرەڵامکە، فێری شتێکت دەکەم کە دەیڵێیت، هیچ شتێك نزیك نابێتەوە لێت. (ئایەتەلکورسی)، هاتم بۆ لای پێغەمبەری خودا (ﷺ) هەواڵم پێدا، فەرمووی: (ڕاستی کردوە، بەڵام خۆی درۆزنە)[1] تیرمیزی لە (فضائل القرءان)دا ڕیوایەتی کردوە (فەرمودەیەکی حەسەنی غەریبە)[2] (الفول) لە زمانی عەرەبیدا، ئەو جنۆکەیەیە لە شەودا دەردەکەوێ، بوخاریش وێنەی ئەم بەسەرهاتەی لە ئەبو هورەیرەوە باس کردوەو لە (کتاب فضائل القرءان و کتاب الوکالة و صفة إبلیس) لە سەحیحەکەدا ڕیوایەتی کردوە. لە ئەبوهورەیرەوە (ڕەزای خوای لێ بێ): پێغەمبەری خودا (ﷺ) کردمی بە بریکاری پاراستنی خێری مانگی ڕەمەزان. شەو یەکێ ئەهات مست مست خواردنی سەرفیترەکەی ئەبرد، گرتم وتم: ئەتبەم بۆ خزمەت پێغەمبەر (ﷺ) وتی: نەدارم‌وماڵ‌و منداڵم هەیە، نەبونیەکی زۆر گران ڕووی تێکردوم. ئەبوهورەیرە وتی: بەرمدا ئازادم کرد، کە ڕۆژم لێبووەوە پێغەمبەر فەرمووی(ﷺ): ئەی ئەبوهورەیرە دیلەکەی شەوت چی لێهات؟ وتی: وتم: ئەی پێغەمبەری خودا زۆر سکاڵای نەبوونی خۆی کرد، بەرم دا. پێغەمبەر فەرمووی(ﷺ): بزانە کە درۆی لەگەڵ کردوی دێتەوە. زانیم کە دێتەوە، چونکە پێغەمبەر(ﷺ) فەرمووی دێتەوە، پاسەوانیم کرد هات، بەلویچ خواردنەکەی ئەبرد، گرتم ،ووتم: ئەتبەم بۆ لای پێغەمبەر (ﷺ) ئەمە دوای سێهەمجارە، هەر ئەڵێی نایەمەوە کەچی دێیتەوە، وتی: بەرمدە، چەند وتیەکەت فێر دەکەم لای خودا سوودی ببێ بۆت. وتم: ئەو وتانە چین؟ وتی: شەو کە چوویتە سەر جێگە ئایەتەلکورسی بخوێنە ﴿ ٱللَّهُ لَآ إِلَٰهَ إِلَّا هُوَ ٱلْحَىُّ ٱلْقَيُّومُ ﴾ هەتا کۆتایی ئایەتەکە. لەلایەن خوداوە پارێزەرێکت لەسەر دەبێ هیچ شەیتانێکت لێ نزیك نابێتەوە تا ڕۆژت لێ ئەبێتەوە. ئەو کاتە بەرمدا، کە ڕۆژم لێ بووەوە پێغەمبەر (ﷺ) فەرمووی: (دیلەکەی شەوت چی لێهات؟) وتم: ئەی پێغەمبەری خودا (ﷺ)یا وتی: چەند وتەیەکت فێر دەکەم، خودای مەزن بەوە بەهرەت پێبدا، پێغەمبەر (ﷺ) فەرمووی: (ئەو وتانە کامانەن؟) وتم: پێی وتم: کە چوویتە ناو جێگە (ئایەتەلکورسی) لە سەرەتاوە تا کۆتایەکەی خوێند:﴿ ٱللَّهُ لَآ إِلَٰهَ إِلَّا هُوَ ٱلْحَىُّ ٱلْقَيُّومُ ﴾ ، پێی وتم: ئەگەر بیخوێنی، لەلایەن خوداوە پارێزەرێکت لەسەر دەبێ ، تا ڕۆژت لێ دەبێتەوە هیچ شەیتانێکت لێ نزیك نابێتەوە. هاوەڵەکانی پێغەمبەر (ﷺ) سوورترین کەس بوون لەسەر چاکە. پێغەمبەر (ﷺ) فەرمووی: (بزانە هەرچەند درۆزنە بەڵام ڕاستی پێ وتوی. دەزانی ئەم سێ شەوە لەگەڵ کێ قسەت کردوە ئەی

---

[1] أحمد (٤١/٥)، سەنەدەکانی لاوازە.

[2] تحفة الاحوذي (١٨٣/٨).

ئەبوهورەیرە؟) وتم: نەخێر، فەرمووی: (ئەوە شەیتانێکە لە شەیتانەکان)[1] نەسائیش ڕوایەتی کردوە لە (الیوم و اللیلة).[2]

## ناوە گەورەکانی خودا (اسم الله الاعظم) لە ئایەتەلکورسیدا

ئیمامی ئەحمەد لە ئەسمای کچی یەزیدی کوڕی سەکەنەوە (السَّکن) ڕیوایەتی کردوە وتی: لە پێغەمبەری خودام بیست (ﷺ)، لەم دوو ئایەتەدا ﴿ ٱللَّهُ لَآ إِلَٰهَ إِلَّا هُوَ ٱلۡحَیُّ ٱلۡقَیُّومُ ﴾ و ﴿الٓمٓ ۝١ ٱللَّهُ لَآ إِلَٰهَ إِلَّا هُوَ ٱلۡحَیُّ ٱلۡقَیُّومُ ﴾[3] جگە لە خودا هیچ کەس بۆ پەرستن ناشێ، هەر ئەو هەمیشە زیندوەو بەسەر هەموو شتێکدا ڕادەگا. ئەیفەرموو: (بێگومان ئەم دوو ئایەتە ناوە گەورەکانی خودای تێدایە)[4] هەر بەم شێوەیە ئەبوداوودو تیرمیزیو ئیبنوماجەو ڕیوایەتیان کردوە، تیرمیزی وتویەتی: فەرموودەیەکی حەسەنی سەحیحە[5] ئیبنومەردەوەیهی لە ئەبوئومامەوە ڕیوایەتی کردوە (بەرزی کردۆتەوە): (ناوە گەورەکەی خودا کاتێکە داوای پێبکرێ، قبوڵی کردوە، لە سێ سورەتا: (سورەتی بەقەرەو ئالی عیمرانو تاها)[6] هیسام (ئیبنوعەمارەکە وتارخوێنی دیمەشق بووە) وتی: لە سورەتی بەقەرەدا ﴿ ٱللَّهُ لَآ إِلَٰهَ إِلَّا هُوَ ٱلۡحَیُّ ٱلۡقَیُّومُ ﴾و لە ئالی عیمراندا ﴿ الٓمٓ ۝١ ٱللَّهُ لَآ إِلَٰهَ إِلَّا هُوَ ٱلۡحَیُّ ٱلۡقَیُّومُ ﴾و لە سورەتی تاهادا ﴿وَعَنَتِ ٱلۡوُجُوهُ لِلۡحَیِّ ٱلۡقَیُّومِ ﴾[7]. هەموو خەڵکی ملکەچی ئەو کەسەن کە نەمرەو پایەدارە.

## ئەم ئایەتە پێك هاتووە لە دە ڕستەی سەربەخۆ

١- ﴿ ٱللَّهُ لَآ إِلَٰهَ إِلَّا هُوَ ﴾: هەواڵە بەوە کە هەر خودا خۆی پەرستراوی گشت بەدیهێنراوەکانە.

٢- ﴿ٱلۡحَیُّ ٱلۡقَیُّومُ ﴾: نەمرو پایەدارەو بەسەر هەموو شتێکدا ڕادەگات، هەموو بونەوەر بە گشت دروست کراوەکانیەوە نیازیان هەر بە خودایە، ئەو بێنیازە لێیانو بەبێ فەرمانی ئەو بوونیان نیە، وەك

---

[1] فتح الباري (٦٧٢/١)، (٥٦٨/٤)، (٣٨٦/٦).

[2] الدارمي (٥٣٢)، فەرموودەیەکی سەحیحە.

[3] آل عمران (١-٢).

[4] أحمد (٤٦١/٦).

[5] أبوداود (١٦٨/٢)، تحفة الاحوذي (٤٤٧/٩)، إبن ماجة (١٢٦٧/٢).

[6] الطبري (٢٨٢/٨)، سەنەدەکانی لاوازە.

[7] طه (١١١).

دەفەرمووێت: ﴿وَمِنْ ءَايَٰتِهِۦٓ أَن تَقُومَ ٱلسَّمَآءُ وَٱلْأَرْضُ بِأَمْرِهِۦ﴾[1] هەر لە نیشانەکانی ئەوە کە ئەم ئاسمانو زەمینە بە فەرمانی ڕاگیرکراون.

٣- ﴿لَا تَأْخُذُهُۥ سِنَةٌ وَلَا نَوْمٌ﴾: نە خەوەنوچکە دەیگرێت و نە دەخەوێت. هیچ کاتێ کەمیو کووڕی ڕووی تێ ناکات، لە دروسکراوەکانی بێئاگا نیە ، بەڵکو چاودێرە بەسەر هەموو کەسێکەوەو دەزانێ چی کردوە، هەموو شتێ دەبینێو هیچی لێ پەنهانی نابێتو وردو درشتی لێ ون نابێ، لە تەواوی پایەداریەتی کە ناخەوێو خەوەنوچکەیش نایباتەوە. خودا لە خەوو خەوەنوچکە بەهێزترە. لەفەرموودەی سەحیحدا هاتووە لە ئەبوموساوە: پێغەمبەری خودا(ﷺ) لە نێوانماندا هەڵسا و چوار وتەی پێ وتین. فەرمووی: (خودا هەرگیز ناخەوێ، دروست نیە کە بخەوێ، تەرازوو بەرز دەکاتەوەو نەویشی دەکات. کاری ڕۆژی بۆ بەرز دەکرێتەوە لە پێش کاری شەودا، کاری شەویشی بۆ بەرز دەکرێتەوە لە پێش کاری ڕۆژدا. پەردەکەی ڕووناکیە (النور) یان ئاگرە، ئەگەر لاییدات پاکیو بێ عەیبی ڕوخساری هەتا ئەو شوێنەی چاو پێیدەگا لە وەدیهێنراوەکانی، دەیسووتێنێ).[2]

٤- ﴿لَّهُۥ مَا فِى ٱلسَّمَٰوَٰتِ وَمَا فِى ٱلْأَرْضِ﴾: هەرچی لە ئاسمانەکانو زەمیندایە هەر هی ئەوە. هەواڵە بەوە کە هەموو بەندەی ئەوەو ئەو خاوەنیەتی. لەژێر دەستەڵاتو توانای ئەودایە. وەك دەفەرمووێت: ﴿إِن كُلُّ مَن فِى ٱلسَّمَٰوَٰتِ وَٱلْأَرْضِ إِلَّآ ءَاتِى ٱلرَّحْمَٰنِ عَبْدًا ﴿٩٣﴾ لَّقَدْ أَحْصَىٰهُمْ وَعَدَّهُمْ عَدًّا ﴿٩٤﴾ وَكُلُّهُمْ ءَاتِيهِ يَوْمَ ٱلْقِيَٰمَةِ فَرْدًا﴾[3] هەرچی لەناو ئەم ئاسمانانو زەمینەن (هەموو بە گشتی) بە بەندایەتی دێنە لای خودا. سەرحیسابی هەموویانەو هەر بە هەژمار ژماردوونی. سەرلەبەریان ڕۆژی قیامەت تاكو تەنیا، دێنە لای ئەو.

٥- ﴿مَن ذَا ٱلَّذِى يَشْفَعُ عِندَهُۥٓ إِلَّا بِإِذْنِهِۦ﴾ :کێ هەیە هەتا (خۆی ئیزنی نەدا) بتوانێ تکای لەلا بکا؟ وەك ئەم ئایەتەش دەفەرمووێت: ﴿وَكَم مِّن مَّلَكٍ فِى ٱلسَّمَٰوَٰتِ لَا تُغْنِى شَفَٰعَتُهُمْ شَيْـًٔا إِلَّا مِنۢ بَعْدِ أَن يَأْذَنَ ٱللَّهُ لِمَن يَشَآءُ وَيَرْضَىٰٓ﴾[4] لەو هەموو ئاسمانانەدا چەندین فریشتە هەیە، کەسیان تکای لێ وەر ناگیرێ مەگەر خودا ئیزنی بداو تکا بۆ کەسێ بکا کە خۆی حەز کاو پێی ڕازی بێ. وەك ئەم ئایەتەیش

---

[1] الروم (٢٥).
[2] مسلم (١٦٢/١).
[3] مريم (٩٣-٩٥).
[4] النجم (٢٦).

کە دەفەرمووێت: ﴿وَلَا يَشْفَعُونَ إِلَّا لِمَنِ ٱرْتَضَىٰ﴾[1] هەرکەسێ (خودا) خۆی ڕازی نەبێ، ناتوانن تکای بۆ بکەن. ئەمەیش گەورەیی‌و دەستەلاتو پایەداری خودا خۆی دەردەخات. کە هیچ کەسێ ناتوانێ‌و بۆی نیە تکا بۆ هیچ کەسێ بکا لەلای مەگەر خودا خۆی ئیزنی بدا تکا بکات. وەك لە فەرموودەکەی تکا کردندا (الشفاعة) هاتووە: (دێمە ژێر تەخت (العرش)، دەچمەسوژدەوە. لە سوژدە ئەمهێڵێتەوە ئەوەندەی کە خۆی مەیلی لێیەتی بمێنمەوە، پاشان پێم دەوترێ: سەرهەڵبڕە! قسە بکە گوێی لێ بگیرێ، تکا بکە قبوول دەکرێ. سنوورێکم بۆ دیاری ئەکرێ (ئەوانە لە ئاگر دێنمە دەرەوە) دەیانخەمە بەهەشت)[2].

٦- ﴿يَعْلَمُ مَا بَيْنَ أَيْدِيهِمْ وَمَا خَلْفَهُمْ﴾: لەوەی ئێستا هەیەو دیارە، لەوەیش پێش ئەمانیش بووەو نادیارە ئاگادارە. ئەمە بەڵگەیە لەسەر ڕاگەیشتنی زانیاری خودا بە هەموو بوونەوەرێ لەڕابردووداو لەئێستاداو لە داهاتوودا. وەك لەبارەی فریشتەکانەوە دەفەرمووێت: ﴿وَمَا نَتَنَزَّلُ إِلَّا بِأَمْرِ رَبِّكَ لَهُۥ مَا بَيْنَ أَيْدِينَا وَمَا خَلْفَنَا وَمَا بَيْنَ ذَٰلِكَ وَمَا كَانَ رَبُّكَ نَسِيًّا﴾[3] بە فەرمانی پەروەردگاری تۆ نەبێ ئێمە دانابەزینە خوارەوە، هەرچی ئێستا لەلامانەو هەرچی لە دوامانەوەیەو هەرچی لەم ناوەدا هەیە، هەر بۆ ئەوەو پەروەردگاری تۆ هیچ شتی لەبیر نەچووە.

٧- ﴿وَلَا يُحِيطُونَ بِشَيْءٍ مِّنْ عِلْمِهِۦٓ إِلَّا بِمَا شَآءَ﴾: ناشتوانن بە شتێك لە زانستی ئەو بزانن، جا مەگەر خۆی بیەوێت. واتە: هیچ کەسێ ئاگادار نابێ لە زانیاری خودا مەگەر ئەوەی کە خودا خۆی ئیزن بداو خۆی کەسێ ئاگادار بکا. هەڵیش دەگرێ مەبەست پێی کەس ئاگادار نابێ لە زانیاری زاتو سیفاتی بێجگەلەوەی کە خودا خۆی ئاگاداری کردبن. وەك دەفەرمووێت: ﴿وَلَا يُحِيطُونَ بِهِۦ عِلْمًا﴾[4] هەر ئەوانن لەبارەی ئەوەوە (خودا) هیچ نازانن.

٨- ﴿وَسِعَ كُرْسِيُّهُ ٱلسَّمَٰوَٰتِ وَٱلْأَرْضَ﴾: زانستی ئەو ئاسمانەکان‌و زەمینی داگرتووە. (وەکیع) لە تەفسیرەکەیدا لە ئیبنوعەبباسەوە ڕیوایەتی کردووە: (الكرس) شوێنی دوو پێن (القدمين). (العرش) هیچ کەسێ ئەندازەکەی نازانێ[5]، (حاکیم) لە (موستەدرەك)ە کەیدا ڕیوایەتی کردوە لە

---

[1] الانبياء (٢٨).
[2] مسلم (١/١٨٠).
[3] مريم (٦٤).
[4] طه (١١٠).
[5] الطبراني (١٢/٢٩).

ئیبنوعەبباسەوە هەر بەو شێوەیە بە (مەوقوفی). دەڵێ: فەرموودەیەکە لەسەر مەرجی بوخاریو موسلیم[1]، بەڵام ئەمان نەیانهێناوە. زەححاك لە ئیبنوعەبباسەوە وتوویەتی: ئەگەر هەر حەوت ئاسمانو هەر حەوت زەویەکە پان بکرێنەوەو پاشا پارچەکانیان بەیەکەوە ببەسترێن، ئاگەنە ئەندازەی کورسی مەگین بە ئەندازەی ئەڵقەیەك لەناو زەویەکی چۆڵی کاکی بە کاکیدا.[2]

٩- ﴿وَلَا يَـُٔودُهُۥ حِفۡظُهُمَا﴾: پاراستنیان بۆ ئەو ئەرکێکی گران نیە. واتە: پاراستنی ئاسمانەکانو زەمینو ئەوەی لەناویاندایە، هیچ قورس نیە لەلای خودا. بەڵکو زۆر سانایەو خودا خۆی پایەدارو بەتوانایە بەسەر گشت شتێکدا کە دەکرێتو چاودێرە بەسەر هەموو شتێکەوەو هیچی لێ شاراوە نیە، هەموو شتێ بەرانبەر بە خودا کەم دەنوێنێو زۆر بچوكو لاوازەو پێویستی بەوەو هەژارەو خودا جێ نیازو سوپاسو ستایش کراوە، هەرچی بویێ دەیکاو زاڵە بەسەر هەموو شتێکاو هەژماری گشت شتێ دەکاو چاودێرو پایە بەرزو زۆر گەورەیە، هیچ پەرستراوێ نیە جگە لەو، پەروەردگاریش هەر ئەوە.

١٠- ﴿وَهُوَ ٱلۡعَلِيُّ ٱلۡعَظِيمُ﴾: هەرە پایە بەرزو مەزن هەر خۆیەتی. وەك دەفەرموویێت: ﴿ٱلۡكَبِيرُ ٱلۡمُتَعَالِ﴾[3] جێ بەرزی هەرە مەزنە. ئەم ئایەتانەو ئەم فەرموودانەش کە هەر لەم مانایەدان، هەموو ئەمانە ڕێبازی زانایانی پێشینەو لەسەری بەردەوام بوون، بێ هاوشێوە بۆ دانانو چۆنیەتی.

﴿لَآ إِكۡرَاهَ فِي ٱلدِّينِۖ قَد تَّبَيَّنَ ٱلرُّشۡدُ مِنَ ٱلۡغَيِّۚ فَمَن يَكۡفُرۡ بِٱلطَّٰغُوتِ وَيُؤۡمِنۢ بِٱللَّهِ فَقَدِ ٱسۡتَمۡسَكَ بِٱلۡعُرۡوَةِ ٱلۡوُثۡقَىٰ لَا ٱنفِصَامَ لَهَاۗ وَٱللَّهُ سَمِيعٌ عَلِيمٌ ٢٥٦﴾

**زۆرکردن لە ئایندا نیە**

خودای مەزن دەفەرموویێت: ﴿لَآ إِكۡرَاهَ فِي ٱلدِّينِۖ قَد تَّبَيَّنَ ٱلرُّشۡدُ مِنَ ٱلۡغَيِّ﴾ لەم ئاینەدا بە زۆر داسەپاندن نیە، پێگەیشتن لە گومڕایی لێك جیا کراوەتەوە. واتە: زۆر لە هیچ کەسێ مەکەن بۆ هاتنە ناو ئاینی ئیسلام، چونکە ئاینێکی ڕوونو ئاشکراو دیارو بەڵگە نەویستە، پێویست ناکا بە زۆر خەڵکی بێتە ناوی، بەڵکو هەرکەسێ خودا شارەزای بکا بۆ ئیسلامو سنگی فراوان بکاو دڵی ڕووناك بکاتەوە، لەسەر بەر چاوڕۆشنی دێتە ناوی، هەرکەسیش خودا دڵی کوێر بکاو مۆر بنێ بەسەر چاوو گوێیدا، بەزۆر هێنانی بۆ ناو ئاین هیچ سوودێکی نیە.وا باس کراوە ئەم ئایەتە لەسەر هۆزێ لە ئەنساریەکان هاتۆتە خوار، هەرچەندە بڕیارەکەی گشتگیرە. ئیبنوجەریر لە ئیبنوعەبباسەوە ڕیوایەتی کردوە وتی:

---

[1] الحاكم (٢/٢٨٢).

[2] إبن أبي حاتم غ: (٣/٩٨١).

[3] الرعد (٩).

ژنێك هەبوو منداڵی نەدەماو (مِعقلاة) ئەمردن، بڕیاریدا ئەگەر منداڵێکی بۆ بمێنیٚ‌و نەمریٚ بیکاتە جوولەکە، کاتیٚ لە بەنی نەزیر دەرکران، کە منداڵی ئەنساریەکانیان لەناودا بوو، وتیان دەست لە منداڵەکانمان هەڵناگرین، خودای مەزن ئەم ئایەتەی ناردە خوارەوە کە دەفەرموویٚت: ﴿لَآ إِكْرَاهَ فِي ٱلدِّينِ قَد تَّبَيَّنَ ٱلرُّشْدُ مِنَ ٱلْغَيِّ﴾[1] ئەبوداوودو نەسائیش ڕیوایەتیان کردوە[2]، بەڵام ئەم فەرموودەی کە ئیمامی ئەحمەد لە ئەنەسەوە ڕیوایەتی کردوە کە پێغەمبەری خودا (ﷺ) فەرمووی بە پیاویٚ (موسوڵمان ببە) وتی: من وا دەزانم ناچار دەبم. فەرمووی: (ئەگەر تۆ ناچاریش بی)[3] بەڵام ئەمە بەو جۆرە نەبووە، پێغەمبەر (ﷺ) زۆری لیٚ نەکردوە کە موسوڵمان ببیٚ. بەڵکو بانگی کردووە بۆ ئیسلام، پیاوەکەیش پێی وتووە دڵی لەسەری نیەو پێی ناخۆشە. پێغەمبەر (ﷺ) پێی فەرمووە: موسوڵمان ببە، هەرچەندە بە لاتەوە گرانیش بیٚ، بێگومان خودا نیەت چاکی‌و دڵپاکیت پیٚ دەبەخشیٚ.

## یەکتا پەرستی دەستەك‌و هەنگڵێکی زۆر توندە بە دەستەوە (کە بڕوایە)

خودای مەزن دەفەرموویٚت: ﴿فَمَن يَكْفُرْ بِٱلطَّٰغُوتِ وَيُؤْمِنۢ بِٱللَّهِ فَقَدِ ٱسْتَمْسَكَ بِٱلْعُرْوَةِ ٱلْوُثْقَىٰ لَا ٱنفِصَامَ لَهَا ۗ وَٱللَّهُ سَمِيعٌ عَلِيمٌ﴾ هەرکەسیٚ حاشا لە تاغووت بکاو بڕوا بە خوا بهێنیٚ، دەستی بە هەنگڵ‌و قوڵفێکی ئەوەندە توندەوە گرتوە ( کە بڕوایە) هەرگیز پسانی بۆ نیە، خودایش بیسەرو زانایە. واتە: هەرکەسیٚ واز لە بتپەرستی دێنیٚ‌و ئەو شتانەی کە شەیتان بانگ دەکا بۆ پەرستنیان بێجگە لە خوا،بەڵام ئەم تەنیا خودا دەپەرستیٚ‌و شایەتی ئەدات کە هیچ شتیٚ بۆ پەرستن ناشیٚ بێجگە لە خودا ﴿فَقَدِ ٱسْتَمْسَكَ بِٱلْعُرْوَةِ ٱلْوُثْقَىٰ﴾ ئەوە ئەوکەسە دەستی گرتووە بە قوڵفێکی زۆر توندو بەهێزەوە (کە بڕوایە)، لەسەر کارەکەی دامەزراوەو لەسەر ڕاستەڕیٚ ڕاوەستاوە. ئەبولقاسمی بەغەوی لە حەسەنی کوڕی فائیدی عەبسیەوە ڕیوایەتی کردوە: عومەر وتوویەتی: (الجِبْت) جادووە. (الطاغوت) شەیتانە. ئازایەتی‌و ترسەنۆکی سروشتو بەهرەیەکە لە پیاواندا. پیاوی ئازاو نەترس شەڕ دەکات لەبەر کەسیٚ کە ناشیناسیٚ. ترسەنۆکیش لە دایکی خۆی ڕادەکاو بەرگری لیٚ ناکات. بێگومان ڕێزی پیاو بە دینەکەیەوە، ڕەوشتیشی نەژادو پلەو پایەیەتی. با ئەو کەسە فارسی بیٚ یان نەبتی (النبطي) بیٚ.[4] مانای قسەکەی کە (الطاغوت) شەیتانە. قسەیەکی زۆر بەهێزە، چونکە هەموو خراپەیەك

---

[1] الطبري (٥/٤٠٧)، فەرموودەیەکی مورسەلە.

[2] أبوداود (٣/١٣٢)، النسائي في الکبرى (٦/٣٠٤)، مورسەلە.

[3] أحمد (٣/١٨١)، فەرموودەیەکی سەحیحە.

[4] الطبري (٥/٤١٧).

دەگرێتەوە کە خەڵك لە چەرخی نەفامیدا لەسەری بوون، لە بتپەرستیو پەنابردن بە بتو داوای یارمەتی لێکردنیان. ﴿فَقَدِ اسْتَمْسَكَ بِالْعُرْوَةِ الْوُثْقَىٰ لَا انفِصَامَ لَهَا﴾ واتە: دەستی گرتووە بەو ئاینەوە بە توندترینو بەهێزترین هۆکارەوە کە هەرگیز ناپچڕێ، چونکە خۆی بۆ خۆی زۆر توندو تۆڵە. هەر بۆیە خودای گەورە دەفەرمووێت: ﴿فَقَدِ اسْتَمْسَكَ بِالْعُرْوَةِ الْوُثْقَىٰ لَا انفِصَامَ لَهَا﴾ موجاهید وتوویەتی: ﴿بِالْعُرْوَةِ الْوُثْقَىٰ﴾ واتە: باوەڕ[1] سودی وتی: واتە: ئیسلام،[2] ئیمامی ئەحمەد لە قەیسی کوڕی عوبادەوە ڕیوایەتی کردوە: من لەناو مزگەوتدا بووم، پیاوێ هاتو لە خواترسیو ملکەچی بە نێوچاوانیەوە دیار بوو، هاتە ژوورەوەو دوو ڕکات نوێژی کرد، زۆر درێژەی پێ نەدا، ئەو خەڵکە وتیان: ئەمە پیاوێکە لە خەڵکی بەهەشت، کاتێ کە چووە دەرەوە شوێنی کەوتم هەتا چووە ماڵەکەی خۆی. ڕۆشتمە ژوورەوەو کەوتمە قسەکردن لەگەڵی، پێم وت: ئەو خەڵکە کاتێ کە تۆ هاتیتە ناو مزگەوت ئاواو ئاوایان وت: ئەویش وتی: پاکیو بێ عەیبی بۆ خوا، هیچ کەسێ بۆی نیە شتێ بڵێ کە نایزانێ. ئێستا بۆت باس ئەکەم لەبەر چی؟ من خەوێکم دی لە سەردەمی پێغەمبەردا (ﷺ) بۆم گێڕایەوە، دیم من لە باخچەیەکی سەوزدام (ئیبنوعەوف وتی: باسی سەوزاییو فراوانی کرد) لە ناوەڕاستیدا ڕاگرێکی ئاسنی تێدا بوو، خوارەوەی لەناو زەمیندا بوو، سەرەوەیشی لە ئاسماندا بوو، لە سەرەوەی عەمودەکە قوڵفێ (بەستەکێ) هەبوو، پێیان وتم: سەرکەوە، وتم: ناتوانم، شاگردێ (مُنصف) هاتە لامو (ئیبنوعەوف وتی: ئەو خزمەتکارە (الرصیف) لە پشتەوە جلو بەرگەکەی بەرز کردمەوە، پاشان وتی: سەرکەوە، سەرکەوتم هەتا دەستم گرت بە قوڵفەکەوە، وتی: دەستت بگرە بە قوڵفەکەوە، لەو کاتەدا خەبەرم بوەوە، وەك ئەوە وابوو قوڵفەکە لەناو دەستما بێت. هاتم بۆ خزمەت پێغەمبەری خودا (ﷺ) خەوەکەم بۆ گێڕایەوە، فەرمووی: (باخچەکە، باخچەی ئیسلامە، عەموودەکەیش عەموودی ئیسلامە، قوڵفەکەیش (العروة الوثقى)یە، تۆ لەسەر ئیسلام دەمێنی هەتا دەمری) وتی: ئەو کەسەیش عەبدوڵڵای کوڕی سەلام بووە[3] بوخاریو موسلیم لە سەحیحەکەیاندا هێناویانە[4]، بوخاری بە شێوەیەکی تریش هێناویەتی[5].

---

[1] الطبري (٥/٤٢١).

[2] الطبري (٥/٤٢١).

[3] أحمد (٥/٤٥٢)، سەحیحە.

[4] فتح الباري (٧/١٦١)، مسلم (٤/١٩٣٠).

[5] فتح الباري (٢/٤١٨).

﴿اللَّهُ وَلِيُّ الَّذِينَ آمَنُوا يُخْرِجُهُم مِّنَ الظُّلُمَاتِ إِلَى النُّورِ ۖ وَالَّذِينَ كَفَرُوا أَوْلِيَاؤُهُمُ الطَّاغُوتُ يُخْرِجُونَهُم مِّنَ النُّورِ إِلَى الظُّلُمَاتِ ۗ أُولَٰئِكَ أَصْحَابُ النَّارِ ۖ هُمْ فِيهَا خَالِدُونَ ﴿٢٥٧﴾﴾

خودا دۆستی ئەوانەیە کە خاوەن باوەڕنو لە تاریکستانەوە بەرەو ڕووناکی دەیانبات، دۆستی خوانەناسانیش هەر تاغووتە، لە ڕووناکیەوە دەریان دەکەن بەرەو تاریکستان بەڕێیان دەکەن. خودای گەورە باسی ئەوە دەکات کە ئەو کەسانە شارەزای ڕێگە دەکات کە شوێن ڕەزامەندی ئەو کەوتوون کە ڕێی دڵنیایی‌و ئارامیە، بەندە خاوەن باوەڕەکانی لەتاریکستانی خوا نەناسی‌و گومانەوە دەردێنێ بەرەو ڕوناکی ئەو هەقە ڕاستو ڕونو ئاشکراو ئاسانەو خوانەناسانیش شەیتان دۆستیانەو ئەو نەفامی و گومراییەی خۆی بۆ جوانو ڕازاوە کردوون، لەو ڕووناکیە دووریان دەخاتەوەو لایان ئەدات بەرەو خوانەناسی‌و درۆو بوختان ﴿أُولَٰئِكَ أَصْحَابُ النَّارِ ۖ هُمْ فِيهَا خَالِدُونَ﴾ ئەوانە دەبێ بچنە ناو ئاگرو هەتا سەر لەوێدا دەبن. بۆیە خودای گەورە بەتاك وتەی ﴿النُّورِ﴾ی هێناوە ﴿الظُّلُمَاتِ﴾تیشی بە کۆ هێناوە. چونکە هەق یەکە، بەڵام خوانەناسی شێوەی زۆرەو هەمووی پووچە، وەك خودای گەورە دەفەرمووێت: ﴿وَأَنَّ هَٰذَا صِرَاطِي مُسْتَقِيمًا فَاتَّبِعُوهُ ۖ وَلَا تَتَّبِعُوا السُّبُلَ فَتَفَرَّقَ بِكُمْ عَن سَبِيلِهِ ۚ ذَٰلِكُمْ وَصَّاكُم بِهِ لَعَلَّكُمْ تَتَّقُونَ﴾[1] ئەمەیە ڕێگەی ڕاستی من، ئێوە هەر بەو ڕێگایەدا بڕۆنو مەچنە سەر ڕێگاکانی تر. نەکا لە ڕێگای ئەو دوورتان بخاتەوە. خودا ئەوانەی بە ئێوە ڕاسپاردوە، بەڵکو خۆتان بپارێزن. هەروەها دەفەرمووێت: ﴿وَجَعَلَ الظُّلُمَاتِ وَالنُّورَ﴾[2] تاریکایی‌و ڕووناکیش ئەو وەدی هێناون. دەفەرمووێت: ﴿عَنِ الْيَمِينِ وَعَنِ الشِّمَالِ عِزِينَ﴾[3] لەلای ڕاستو چەپەوە دەستە دەستە دێن. چەندین ئایەتی تریش بەم شێوەیە هاتوون. دەریان خستوە کە هەق یەکەو ناهەقیش وپووچیش شێوەو ڕێگەی زۆری هەیە.

﴿أَلَمْ تَرَ إِلَى الَّذِي حَاجَّ إِبْرَاهِيمَ فِي رَبِّهِ أَنْ آتَاهُ اللَّهُ الْمُلْكَ إِذْ قَالَ إِبْرَاهِيمُ رَبِّيَ الَّذِي يُحْيِي وَيُمِيتُ قَالَ أَنَا أُحْيِي وَأُمِيتُ ۖ قَالَ إِبْرَاهِيمُ فَإِنَّ اللَّهَ يَأْتِي بِالشَّمْسِ مِنَ الْمَشْرِقِ فَأْتِ بِهَا مِنَ الْمَغْرِبِ فَبُهِتَ الَّذِي كَفَرَ ۗ وَاللَّهُ لَا يَهْدِي الْقَوْمَ الظَّالِمِينَ ﴿٢٥٨﴾﴾

---

[1] الانعام (١٥٣).
[2] الانعام (١).
[3] المعارج (٣٧).

## ڕووبەڕووبونەوەی ئیبراهیمی خەلیل لەگەڵ نەمرودا

موجاهیدو کەسانی تریش وتویانە: ئەو کەسەی کە ئیبراهیم وتوێژو مشتومڕی لەگەڵدا کرد دەربارەی خودای گەورە پاشای بابل بوو، نەمرودی کوڕی کەنعانی کوڕی کوشی کوڕی سامی کوڕی نووح بووە. هەندێکیش دەڵێن نمرودی کوڕی فالخی کوڕی عابیری کوڕی شالخی کوڕی أرفخشزی کوڕی سامی کوڕی نووح بووە. موجاهید وتویەتی: فەرمانڕەوای سەر زەمین لە خۆرهەڵاتو خۆرئاوادا چوار کەس بوون: دوو باوەڕدارو دوو بێباوەڕ، دوو بڕوادارەکە کە سولەیمانو داوود بووە، دوو خوانەناسەکەیش نەمروژو بەختەنەسەر بووە[1] والله أعلم. خودای گەورە دەفەرمووێت: ﴿أَلَمْ تَرَ إِلَى الَّذِي حَاجَّ إِبْرَاهِيمَ فِي رَبِّهِ أَنْ آتَاهُ اللَّهُ الْمُلْكَ﴾ تۆ ئەو کابرایەت نەدیبوو کە چۆن خودا هێزو دەستەڵاتی پێدا، مشتومڕی لەگەڵ ئیبراهیمدا دەکرد. واتە: بە دڵ نەدیبوو ئەی موحەممەد (ﷺ) کە دەربارەی بوونی خودا قسەی دەکرد، باوەڕی نەبوو کە جگە لە خۆی خودایەکی تر هەیە. وەك چۆن فیرعەون بە مووسای دەوت: ﴿مَا عَلِمْتُ لَكُم مِّنْ إِلَٰهٍ غَيْرِي﴾[2] واناازانم بێجگە لە من خوایەکتان هەبێ. ئەوەی کە وای لێ کردبوو ئەو سەرکەشیو خوانەناسیو دڵڕەقیو بێ بەزەییو زۆرداریە بنوێنێ، ئەو دەستەڵاتو ماوە زۆرەی بوو کە فەرمانڕەوا بوو بەسەر ئەو خەڵکەوە، بۆیە دەربارەی پەروەردگاری، ئەو قسانەی دەکرد. خودای گەورەیش دەفەرمووێت: ﴿أَنْ آتَاهُ اللَّهُ الْمُلْكَ﴾ کە خودا ئەو هێزو دەستەڵاتەی پێدا بوو. ئەوە بوو داوای بەڵگەو نیشانەی لە ئیبراهیم کرد لەسەر بوونی ئەو خودایە کە داوای لێ دەکاو لێی دەپاڕێتەوە. ﴿إِذْ قَالَ إِبْرَاهِيمُ رَبِّيَ الَّذِي يُحْيِي وَيُمِيتُ﴾ ئەو کاتە ئیبراهیم وتی: پەروەردگاری من کەسێکە ژیان ئەداو دەشمرێنێ. واتە: نیشانە لەسەر بوونی خودا، دروست بوونی ئەم هەموو شتەیە بە چاو دوای ئەوە کە نەبووەو پەیدا دەبێو پاشانیشس نامێنێ. ئەمە نیشانەیە لەسەر وەدیهێنەری خاوەن دەستەڵاتی بەتوانا. خۆ ئەمانە خۆیان دروست نەکردوە، دەبێ کەسێ دروستی کردبن کە وەدیهێنەریانە، ئەویش ئەو پەروەردگاریە کە من بانگەواز دەکەم بۆ پەرستنیو تاكو تەنیایەو هاوەڵی نیە. خودای گەورە دەفەرمووێت: ﴿قَالَ أَنَا أُحْيِي وَأُمِيتُ﴾ لەوکاتەدا نمروز وتی: منیش زیندوو دەهێڵمەوەو دەمرێنم. قەتادە وتی موحەممەدی کوڕە ئیسحاقو سوودیو کەسانی تریش وتویانە: نمروز وتی: منیش دوو پیاو دەهێنم. فەرمان ئەدەم یەکێکیان بکوژن، لەوی

---

[1] الطبري (٥/٤٣٣).

[2] القصص (٣٨).

تریان دەبوورم‌و نەکوژری. ئەوە مانای زیندوو هێشتنەوەو مراندنە.[1] وا دەردەکەوێ (والله أعلم) مەبەستی نمروز ئەوە بووە بڕوای بە وەلامەکەی ئیبراهیم نەبووە، ئەوە بەلگە نیە بۆ بوونی وەدیهێنەر. ویستویەتی ئەو دەستەلاتو توانایە بە لاساری‌و لەخۆبایی بوون بۆ خۆی دابنێ بە خەیالی خۆی. ئەو هەر خۆیەتی دەژێنی‌و دەمرێنێ. وەك فیرعەون کە هەر قسەکەی ئەوی کردوە، وەك خودای گەورە دەفەرموێت: ﴿مَا عَلِمْتُ لَكُم مِّنْ إِلَٰهٍ غَيْرِي﴾[2] وانازنم بێجگە لە من خودایەکتان هەبێ. هەر بۆیە ئیبراهیم ئەمەی پێ وت کاتێ کە ئەو خۆبەزل زانیەی لێوە بینی: ﴿قَالَ إِبْرَاهِيمُ فَإِنَّ اللَّهَ يَأْتِي بِالشَّمْسِ مِنَ الْمَشْرِقِ فَأْتِ بِهَا مِنَ الْمَغْرِبِ﴾ ئیبراهیم وتی: پەروەردگارم خۆر لە خۆرهەلات دەردێنێ، سا تۆ لە خۆرنشینەوە بێنی. واتە: تۆ وەك خۆت دەلێی ژیان ئەدەی‌و دەشمرێنی، ئەو کەسەی کە ژیان ئەداو دەمرێنێ، ئەو کەسەیە کە دەستەلاتی بەسەر بونەوەردا هەیەو لە وەدیهێنان‌و ڕام کردن‌و جولان‌و هاتوچۆ کردنی. ئەم خۆرە لە خۆرهەلاتەوە هەلدێ، ئەگەر تۆ خۆت بە خودا دەزانی وەك خۆت دەلێیت، سا تۆ لە خۆرئاواوە بیهێنە؟ کاتێ بێ دەستەلاتی خۆی بینی کە توانای ئەوەی نیە،حەپەساو توانای قسەکردنی نەماو دۆڕاندی. خودای گەورەیش دەفەرموێت: ﴿فَبُهِتَ الَّذِي كَفَرَ ۗ وَاللَّهُ لَا يَهْدِي الْقَوْمَ الظَّالِمِينَ﴾ کابرای بێباوەڕ حەپەسا، خوداش کۆمەلی ستەمکاران لە ڕێگە شارەزا ناکا. واتە: خودا هیچ بەلگەو نیشانەیەك بە ستەمکاران نادا، لەلای خودا سەرشۆڕو زەلیلن‌و زۆر تورەیە لێیان‌و جەزرەبەی توند ئەدرێن. هێنانی ئەم باسە بەم شێوەیە زۆر گرنگەوەك زۆرێك لە زانایانی مەنتیق (المنطقيين) باسیان کردوە. لادان‌و چوونی ئیبراهیم لە بەلگەی یەکەمەوە بۆ بەلگەی دووهەم، لە نیشانەیەکەوە بۆ نیشانەیەکی روون‌و ئاشکرا تر. پڕوپوچی ئەو بانگەشەیەی نمروز دەردەخات کە لە یەکەم جارو دووهەم جاریشا دەیوت، سوپاس‌و ستایش بۆ خودای گەورە. سوودی وتویەتی: ئەم مشت‌ومڕەی نێوان ئیبراهیم‌و نمروز ، دوای دەرچوونی ئیبراهیم بووە لەناو ئاگرەکە. هەرگیز ئیبراهیم لەگەل نمروز دانەنیشتوەو کۆنەبوەتەوە، لەو ڕۆژەدانەبێ ئەو ڕووبەڕووبونەوەیە لە نێوانیاندا ڕوویداوە.

﴿أَوْ كَالَّذِي مَرَّ عَلَىٰ قَرْيَةٍ وَهِيَ خَاوِيَةٌ عَلَىٰ عُرُوشِهَا قَالَ أَنَّىٰ يُحْيِي هَٰذِهِ اللَّهُ بَعْدَ مَوْتِهَا ۖ فَأَمَاتَهُ اللَّهُ مِائَةَ عَامٍ ثُمَّ بَعَثَهُ ۖ قَالَ كَمْ لَبِثْتَ ۖ قَالَ لَبِثْتُ يَوْمًا أَوْ بَعْضَ يَوْمٍ ۖ قَالَ بَل لَّبِثْتَ مِائَةَ عَامٍ فَانظُرْ إِلَىٰ طَعَامِكَ

---

[1] الطبري (٥/٤٣٣-٤٣٧).

[2] القصص (٣٨).

وَشَرَابِكَ لَمْ يَتَسَنَّهْ وَانظُرْ إِلَىٰ حِمَارِكَ وَلِنَجْعَلَكَ ءَايَةً لِّلنَّاسِ وَانظُرْ إِلَى الْعِظَامِ كَيْفَ نُنشِزُهَا ثُمَّ نَكْسُوهَا لَحْمًا فَلَمَّا تَبَيَّنَ لَهُ قَالَ أَعْلَمُ أَنَّ اللَّهَ عَلَىٰ كُلِّ شَيْءٍ قَدِيرٌ ﴿٢٥٩﴾

**بەسەرهاتی عوزەیر (سەلامی خوای لێ بێ)**

له پێشەوه لەم ئایەتەدا كه خودای گەوره دەفەرمووێت: ﴿أَلَمْ تَرَ إِلَى الَّذِي حَاجَّ إِبْرَاهِيمَ فِي﴾ تۆ ئەو كابرایەت نەدیبوو كه دەمەقاڵێی لەگەڵ ئیبراهیمدا دەكرد، ئەم ئایەتەیشی بەدوادا هێناوە: ﴿أَوْ كَالَّذِي مَرَّ عَلَىٰ قَرْيَةٍ وَهِيَ خَاوِيَةٌ عَلَىٰ عُرُوشِهَا﴾ یان ئەو كەسەی بە لای گوندێكدا تێپەڕی كه بەسەر یەكدا تەپیبوو، ئیبنوئەبی حاتەم له ناجیەی كوڕی كەعبەوه ڕیوایەتی كردوه له عەلی كوڕی ئەبوتالیبەوه كه وتی: ئەو كەسه عوزەیر بووه.[1] ئیبنوجەریر هەر له ناجیەوه ڕیوایەتی كردوه.[2] ئیبنوجەریرو ئیبنوئەبی حاتەم ڕیوایەتیان كردوه له ئیبنوعەبباس‌و حەسەن‌و قەتادەو سوودیو سولەیمانی كوڕی بورەیدەوه[3]. موجاهیدی كوڕی جەبر وتی: پیاوێك بووه له نەوەی ئیسرائیل. بەڵام گوندەكه وەك ناسراوه قودسی پیرۆزه كه بەلایدا تێپەڕیوه پاش ئەوەی بەختەنەسر ڕوخاندوویەتی بەسەر یەكاو خەڵكەكەی كوشتوه ﴿وَهِيَ خَاوِيَةٌ عَلَىٰ عُرُوشِهَا﴾ ئەو گونده بەسەر یەكدا تەپیبوو، كەسی تیدا نەما بوو، وەستاو ڕاما لەوەی كه چی بەسەر هاتووه، دوای ئەو هەموو كۆشك‌و تەلارسازیه كه تێیدا بووه ﴿قَالَ أَنَّىٰ يُحْيِي هَٰذِهِ اللَّهُ بَعْدَ مَوْتِهَا﴾ وتی: خودا چۆن ئەم شاره ئاوەدان دەكاتەوه پاش مردنی؟ خودای گەوره دەفەرمووێت: ﴿فَأَمَاتَهُ اللَّهُ مِائَةَ عَامٍ ثُمَّ بَعَثَهُ﴾ ئەوسا خودا بۆ ماوەی سەد ساڵ مراندی. وتی: ئەو شاره دوای حەفتا ساڵ پاش مردنی ئاوەدانی كردەوەو ئەو خەڵكەی تیا نیشتەجێ بوو. نەوەی ئیسرائیلیش گەڕانەوه ناوی. كاتێ كه خودا زیندووی كردەوه ، یەكەم شتێ كه زیندووی كردەوه تێیدا چاوەكانی بوو، بۆ ئەوه سەیری كارسازی خودای پێ بكات كه چۆن لاشەی زیندوو دەكاتەوه، كاتێ به تەواوی هاتەوه سەر خۆی، خودای گەوره بەهۆی فریشتەوه ئاگاداری كرد ﴿قَالَ كَمْ لَبِثْتَ قَالَ لَبِثْتُ يَوْمًا أَوْ بَعْضَ يَوْمٍ﴾ فەرمووی: چەندت پێ چوو؟ وتی: ڕۆژێك یاخۆ كەمتریش له ڕۆژێك. دەڵێن: لەبەر ئەوەی له سەرەتای بەیاندا مرد، پاشان خودا له كۆتایی ڕۆژا زیندووی كردەوه. كاتێ كه بینی خۆر هێشتا ئاوا نەبووه، وای زانی هەر خۆری ئەو ڕۆژەیە. خودای مەزن لەسەر زمانی

---

[1] إبن أبي حاتم (٣/١٠٠٩).

[2] الطبري (٥/٤٣٩).

[3] الطبري (٥/٤٣٩-٤٤٠)، إبن أبي حاتم غ: (٣/١٠٠٩-١٠١٠).

ئەو پیاوە دەفەرمووێت: ﴿أَوۡ بَعۡضَ يَوۡمٍۖ﴾ یا کەمێك لە ڕۆژێك. ﴿قَالَ بَل لَّبِثۡتَ مِاْئَةَ عَامٍ فَٱنظُرۡ إِلَىٰ طَعَامِكَ وَشَرَابِكَ لَمۡ يَتَسَنَّهۡۖ﴾ نەخێر، تۆ سەد ساڵە مردووی، دە بڕوانە خواردەمەنیو خواردنەوەکەت نەگۆڕاون. وەك باس کراوە تریو هەنجیرو شەربەتی پێ بووە، چۆن بەجێی هێشتبوو هیچ گۆڕانێکی بەسەردا نەهاتبوو، شەربەتەکە نەگۆڕا بوو، هەنجیرەکە نەترشا بوو، ترێکەیش خۆی نەخواردبۆوە. ﴿وَٱنظُرۡ إِلَىٰ حِمَارِكَ﴾ گوێدرێژەکەشت بکە. واتە: چۆن خودا زیندووی دەکاتەوە تۆ سەیری دەکەی ﴿وَلِنَجۡعَلَكَ ءَايَةٗ لِّلنَّاسِۖ﴾ دەمانەوێ بتکەینە بەڵگەو نیشانەبۆ خەڵکی لەسەر زیندووبوونەوە. ﴿وَٱنظُرۡ إِلَى ٱلۡعِظَامِ كَيۡفَ نُنشِزُهَا﴾ لەم ئێسکانەش بڕوانە، چۆن پێکیان دەخەینەوە ﴿ثُمَّ نَكۡسُوهَا لَحۡمٗاۚ﴾ پاشان گۆشتیان هەڵدەکێشین. واتە: بەرزی دەکەینەوە هەندێکی بە هەندێکیەوە دەبەستینەوە. حاکیم لە موستەدرەکەکەیدا لە خاریجەی کوڕی زەیدی کوڕی سابیتەوە لە باوکیەوە کە پێغەمبەری خودا(ﷺ) ئەم دەقەی خوێندەوە کە خودای مەزن دەفەرمووێت: ﴿كَيۡفَ نُنشِزُهَا﴾ بە پیتی (الزای) پاشان وتی: سەنەدەکانی سەحیحە.[1] و بە (نَنْشُرها) خوێنراوەتەوە واتە: چۆن زیندووی دەکەینەوە، ئەمە قسەی موجاهیدە[2] ﴿ثُمَّ نَكۡسُوهَا لَحۡمٗاۚ﴾ پاشان گۆشتیان هەڵدەکێشین. سوودیو کەسانی تریش وتویانە، ئێسکی کەرەکەی بە دەوریا، بە لای ڕاستو چەپا بڵاو بووبۆوە. سەیری دەکرد سپی دەکردەوە، خودای گەورە بایەکی نارد، لەو شوێنانەدا هەمووی کۆ کردەوە، پاشان هەر ئێسکێکی لە شوێنی خۆی دانایەوە، تا وای لێهات وەك پەیکەری کەرەکەی لێهاتەوە. پاشان خودای گەورە گۆشتو دەمارو هەستو پێستی کردەوە بە بەریدا، پاشان فریشتەیەکی نارد فوی کرد بە لووتی (کەپوی) کەرەکەداو بە ئیزنی خودای مەزن[3] وەك نیشانەی زیندووبوونی_ دەستی بەزەڕین کرد_ ئەمانە هەمووی بە بەرچاوی عوزەیرەوەڕوویاندا .﴿قَالَ أَعۡلَمُ أَنَّ ٱللَّهَ عَلَىٰ كُلِّ شَيۡءٖ قَدِيرٞ﴾ وتی: وا ئێستا دەزانم خودا هەموو کارێکی پێدەکرێ. وا بە چاوی خۆم بینیم، منیش خەڵکی ئەم زەمانەی خۆمی لێ ئاگادار دەکەم.

---

[1] الحاكم (٢/٢٣٤)، حاکم ئەڵێت: فەرموودەیەکی سەحیحە.

[2] الطبري (٥/٤٧٦).

[3] الطبري (٥/٤٦٨).

﴿وَإِذْ قَالَ إِبْرَٰهِـۧمُ رَبِّ أَرِنِي كَيْفَ تُحْيِ ٱلْمَوْتَىٰ قَالَ أَوَلَمْ تُؤْمِن قَالَ بَلَىٰ وَلَٰكِن لِّيَطْمَئِنَّ قَلْبِي قَالَ فَخُذْ أَرْبَعَةً مِّنَ ٱلطَّيْرِ فَصُرْهُنَّ إِلَيْكَ ثُمَّ ٱجْعَلْ عَلَىٰ كُلِّ جَبَلٍ مِّنْهُنَّ جُزْءًا ثُمَّ ٱدْعُهُنَّ يَأْتِينَكَ سَعْيًا وَٱعْلَمْ أَنَّ ٱللَّهَ عَزِيزٌ حَكِيمٌ ﴿٢٦٠﴾﴾

**داوای ئیبراهیمی خەلیل لە خودا کە نیشانی بدا چۆن مردوو زیندوو دەکاتەوە**

چەند هۆکارێ باس کراوە لەسەر ئەو داوایەی ئیبراهیم (سەلامی خوای لێ بێ) لەوانە: کاتێ کە وتی بە نمرود: ﴿رَبِّيَ ٱلَّذِي يُحْيِۦ وَيُمِيتُ﴾ پەروەردگاری من کەسێکە ژیان دەداو دەشمرێنێ. ئیبراهیم پێی خۆش بوو لەو بارەیەوە ڕاستەقینە بزانێو بە چاوی خۆی سەیری بکات ﴿وَإِذْ قَالَ إِبْرَٰهِـۧمُ رَبِّ أَرِنِي كَيْفَ تُحْيِ ٱلْمَوْتَىٰ قَالَ أَوَلَمْ تُؤْمِن قَالَ بَلَىٰ وَلَٰكِن لِّيَطْمَئِنَّ قَلْبِي﴾ کاتێ کە ئیبراهیم وتی: پەروەردگارم. پیشانم بدەتۆچۆن مردووەکان زیندوو دەکەیتەوە؟ فەرمووی:بۆچی تۆ هێشتا باوەڕت نیە؟ وتی: بەڵێ، بەڵام دەمەوێ بە تەواوی دڵنیا بم. بەڵام ئەو فەرموودەیەی کە بوخاری ڕیوایەتی کردوە لە لای ئەم ئایەتەدا کە ئەبوهورەیرە ڕیوایەتی کردوە (ڕەزای خوای لێ بێ) وتی: پێغەمبەری خودا (ﷺ) فەرموویەتی: (ئێمە شایەنترین بە گومان لە ئیبراهیم کاتێ وتی: ﴿قَالَ بَلَىٰ وَلَٰكِن لِّيَطْمَئِنَّ قَلْبِي﴾)[1] واتە: ئێمە شایەنترین (ئەهەق ترین) بە داواکردنی دڵنیایی (الیقین).

**وەڵامی داوای ئیبراهیم (سەلامی خوای لێ بێ)**

خودای مەزن بە ئیبراهیمی فەرموو: ﴿قَالَ فَخُذْ أَرْبَعَةً مِّنَ ٱلطَّيْرِ فَصُرْهُنَّ إِلَيْكَ﴾ فەرمووی: دەسا چوار مەل بگرە پەل پەلیان کەو بیانکەبە چوار بەش. زانایانی تەفسیر لەسەر ئەم چوار مەلە ناکۆکن کەچ جۆرە مەلێکن؟ دیاری کردنیشیان هیچ سوودێك ناگەیەنێ، خۆ ئەگەر گرنگ بوایە قورئان باسی دەکرد. خودای گەورە دەفەرموێت: ﴿فَصُرْهُنَّ إِلَيْكَ﴾ پەل پەلیان کەو بیانکە بە چوار بەش. ئەمە قسەی ئیبنوعەبباسو عیکرمەو سەعیدی کوڕی جەبەیرو ئەبومالیکو ئەبوئەسوەدی دوئەلی و وەهەبی کوڕی مونەبە و حەسەنو سوودیو کەسانی تریشە.[2] دەڵێن: چوار مەلی هێناو سەری بڕینو پارچەپارچەی کردنو پەڕەکانی لێکردنەوەو تێکەڵی کردن. پاشان کردنی بە چەند بەشێکەوە، هەر بەشێکی لەسەر کێوێ دانا. وتراوە: چوار کێو، وتراویشە حەوت کێو، ئیبنوعەبباس وتوویەتی: سەری مەلەکانی بە دەستی خۆیەوە گرت، پاشان خودای مەزن فەرمانی پێکرد بانگیان بکات، ئەویش چۆن

---

[1] فتح الباري (٨/٤٩).

[2] إبن أبي حاتم غ: (٣/١٠٣٩-١٠٤٠).

خودا فەرمانی پێدابوو بانگی کردن، پاشان بینی پەڕەکان چۆن بۆ لای یەکتر دەفڕین و خوێن بۆ لای خوێن و گۆشت بۆ لای گۆشت دەڕۆشت، پارچەکانی هەر مەلێ دەچوونەوەناو یەك و پێکەوە دەنووسانەوە، هەتا هەر مەلێ وەك خۆی لێهاتەوەو، بە پەلە دەهاتنەوە بۆ لای ئیبراهیم. هەر مەلێ دەهات بۆ ئەوەی سەرەکەی خۆی لە دەستی ئیبراهیم (سەلامی خوای لێ بێ) وەرگرێ، کاتێ کە ئەو مەلە دەهاتە لای سەرەکەی دەگۆڕی، مەلەکە لێی وەرنەدەگرت. بەلام کاتێ کە سەرەکەی خۆی ئەدایە ، بە لاشەکەیەوەدەلکایەوە بە تواناو دەسەلاتی خودای گەورە[1]، هەر بۆیە دەفەرمووێت:

﴿وَاعْلَمْ أَنَّ اللَّهَ عَزِيزٌ حَكِيمٌ﴾ بشزانە خودا چەندە خاوەن دەسەلاتو لە کارزانە. واتە: خاوەن دەسەلاتە، هیچ کەس توانای نیە بەسەریداو نابێتە ڕێگری، چونکە خودا زۆر مەزن و زاڵە بەسەر هەموو شتێکداو لە کارزانە لە کردارو گفتارو لە بەرنامەو بڕیاریدا. عەبدوڕەزاق وتوویەتی: موعەمەر لە ئەیوبەوە: لەم دەقەدا کە خودای گەورە دەفەرمووێت: ﴿وَلَٰكِن لِّيَطْمَئِنَّ قَلْبِي﴾ ئیبنوعەبباس وتوویەتی: لەناو قورئاندا لەم دەقە بە ئومێدتر نیە لەلای من[2] (واتە: زۆر جێی ئومێدە لەلام) ئیبنوئەبی حاتەمیش لە موحەممەدی کوڕی مونکەدەرەوە ڕیوایەتی کردوە کە: عەبدوڵلای کوڕی عەبباس و عەبدوڵلای کوڕی عەمری کوڕی عاس گەیشتن بە یەك، عەبدوڵلای کوڕی عەبباس بە عەبدوڵلای کوڕی عەمری کوڕی عاسی وت: کام ئایەتە لە قورئاندا زۆر جێی ئومێدە لەلای تۆ؟ عەبدوڵلای کوڕی عەمر، وتی: ئەم ئایەتە کە خودای گەورە دەفەرموێت: ﴿قُلْ يَا عِبَادِيَ الَّذِينَ أَسْرَفُوا عَلَىٰ أَنفُسِهِمْ لَا تَقْنَطُوا مِن رَّحْمَةِ اللَّهِ ۚ إِنَّ اللَّهَ يَغْفِرُ الذُّنُوبَ جَمِيعًا﴾[3] بلێ: ئەی عەبدەکانی من، ئەی ئەوانەی کە بە لادان لە ئەندازە ناهەقیتان لە خۆتان کردوە، نابێ ئێوە لە بەزەیی خوا بێ هیوا بن، چونکە لە هەموو گوناهێك چاو دەپۆشێ. ئیبنوعەبباس وتی: بەلام من دەڵێم: ئەم ئایەتە کە خودای گەورە دەفەرموێت: ﴿وَإِذْ قَالَ إِبْرَاهِيمُ رَبِّ أَرِنِي كَيْفَ تُحْيِي الْمَوْتَىٰ ۖ قَالَ أَوَلَمْ تُؤْمِن ۖ قَالَ بَلَىٰ﴾ کە لە ئیبراهیم ڕازی بوو کە وتی ﴿بَلَىٰ﴾ وتی: ئەمە کاتێ کە دەنەفسەکان تووشی گومان دەبن و بە هۆیەوە شەیتان دڵەکان کرمێ دەکات.[4] هەر بەم شێوەیە حاکیم لە موستەدرەکەکەیدا ڕیوایەتی کردوە. پاشان وتی: سەنەدەکەی سەحیحە.[5]

---

[1] القرطبي (٣/٣٠٠).

[2] الطبري (٥/٤٨٩).

[3] الزمر (٥٣).

[4] إبن أبي حاتم غ: (٣/١٠٣٢).

[5] الحاكم (٤/٢٦٠).

﴿مَثَلُ ٱلَّذِينَ يُنفِقُونَ أَمْوَٰلَهُمْ فِي سَبِيلِ ٱللَّهِ كَمَثَلِ حَبَّةٍ أَنۢبَتَتْ سَبْعَ سَنَابِلَ فِي كُلِّ سُنۢبُلَةٍ مِّاْئَةُ حَبَّةٍۗ وَٱللَّهُ يُضَٰعِفُ لِمَن يَشَآءُۗ وَٱللَّهُ وَٰسِعٌ عَلِيمٌ ﴿٢٦١﴾﴾

### پاداشتی ماڵ بەخشین لە ڕێگەی خوا

ئەمە نموونەکەیە خودای مەزن هێناویەتەوە بۆ چەند بارەی پاداشتی ئەو کەسانەی کە ماڵیان بەخشیوە لە ڕێی خوداو ڕەزامەندی ئەودا، بێگومان چاکە بە دەبارە هەتا حەفتا بارە پاداشت ئەدرێتەوە: ﴿مَثَلُ ٱلَّذِينَ يُنفِقُونَ أَمْوَٰلَهُمْ فِي سَبِيلِ ٱللَّهِ كَمَثَلِ حَبَّةٍ أَنۢبَتَتْ سَبْعَ سَنَابِلَ فِي كُلِّ سُنۢبُلَةٍ مِّاْئَةُ حَبَّةٍ﴾ نموونەی ئەو کەسانەی ماڵیان لە ڕێی خوادا دەبەخشن، وەك نمونەی دەنكێكە حەوت گوڵ دەركاتو هەر گوڵەیش سەد دانەی تێدا بێ، سەعیدی کوڕی جوبەیر وتی: ﴿فِي سَبِيلِ ٱللَّهِ﴾ واتە: لە گوێڕایەڵی خوادا.[1] مەکحول وتی: واتە: ماڵ بەخشین لە جیهادو ئامادەکردنی ولاغی سواری بۆ پاراستنی سنووری ئیسلام بەرانبەر دوژمنو چەكو پێویستیەکانی تریش،[2] ئەم نموونەیە زیاتر کاردەکاتە سەر دڵەکان لە هێنانی ژمارەی حەوت سەد، چونکە ئەمە ئاماژەیە بۆ ئەوە کە خودای گەورە ئاکاری چاك گەشە پێدەکا بۆ خاوەنەکەی، وەك چۆن کشتوکاڵ گەشە دەکات بۆ کەسێ کە لە زەویەکی پاکی بە پیتا بیچێنێ. فەرموودە هاتووە بۆ چەند بارە بوونەوەی چاکە هەتا حەوت سەد جار. ئیمامی ئەحمەد لە ئەبومەسعودەو ڕیوایەتی کردوە: پیاوێك وشترێکی لغاوکراوی بەخشی لە ڕێی خوادا، پێغەمبەری خودا (ﷺ) فەرمووی: (لە ڕۆژی قیامەت حەوت سەد وشتری دەدرێتێ هەر هەمووی لغاوکراون)[3] موسلیمو نەسائی ڕیوایەتیان کردوە، لە ڕیوایەتی موسلیمدا هاتووە: (پیاوێ وشترێکی لغاوکراوی هێناوتی: ئەی پێغەمبەری خودا(ﷺ) ئەمەلە ڕێی خوادا، پێغەمبەر(ﷺ) فەرمووی: (لە ڕۆژی قیامەتدا حەوت سەد وشترت دەدرێتێ هەر هەمووی لغاو کراون).[4]

### فەرموودەیەکی تر

ئیمامی ئەحمەد لە ئەبوهورەیرەوە ڕیوایەتی کردوە: پێغەمبەری خودا (ﷺ) فەرموویەتی: (هەموو کردەوەیەکی نەوەی ئادەم چەند بارە دەبێتەوە، چاکەیەك بە دە ئەوەندەی خۆی. هەتا چەندێ خودا بیەوێ. خودای مەزن دەفەرمووێت: جگە لە ڕۆژوو، ئەوە بۆ منەو خۆم پاداشتی ئەدەمەوە، واز لە

---

[1] إبن أبي حاتم غ: (٣/١٠٤٧).

[2] إبن أبي حاتم (٣/١٠٤٧).

[3] أحمد (٤/١٢١)، سەحیحە.

[4] مسلم (٣/١٥٠٥)، النسائي (٦/٤٩).

خواردن‌و ئارەزوی خۆی دەهێنێ لەبەر من، دوو خۆشی هەیە بۆ ڕۆژووەوان، خۆشیەك لە كاتی بەربانگ كردنەوەیداو خۆشیەكیش كاتێ بە دیداری پەروەردگاری شاد دەبێ، بۆنی دەمی ڕۆژووەوان لە لای خودا لە بۆنی میسك خۆشترە، ڕۆژو قەڵغانە، ڕۆژو قەڵغانە).[1] موسلیم هەر بەم شێوەیە ڕیوایەتی كردوە لێرەیشدا دەفەرموێت: ﴿وَٱللَّهُ يُضَٰعِفُ لِمَن يَشَآءُۚ وَٱللَّهُ وَٰسِعٌ عَلِيمٌ﴾ خودا چەند ئەوەندە پاداشت ئەدات بە هەركەس بیەوێ، خودا چاكەی یەكجار زۆرەو زۆر زانایە. بەپێی دڵپاكی ئەو كەسە لە كردارەكانیداو بەزەیی زۆر فراوانە بەرانبەر بە خەڵك زیاتر لە خۆیان، دەشزانێ كێ شایەنی چاكەیەو كێش شایەنی نیە، پاكی‌و بێ عەیبی‌و سوپاس‌و ستایش هەر بۆ ئەوە.

﴿ٱلَّذِينَ يُنفِقُونَ أَمْوَٰلَهُمْ فِى سَبِيلِ ٱللَّهِ ثُمَّ لَا يُتْبِعُونَ مَآ أَنفَقُوا۟ مَنًّا وَلَآ أَذًىۙ لَّهُمْ أَجْرُهُمْ عِندَ رَبِّهِمْ وَلَا خَوْفٌ عَلَيْهِمْ وَلَا هُمْ يَحْزَنُونَ ﴿٢٦٢﴾ ۞ قَوْلٌ مَّعْرُوفٌ وَمَغْفِرَةٌ خَيْرٌ مِّن صَدَقَةٍ يَتْبَعُهَآ أَذًىۗ وَٱللَّهُ غَنِىٌّ حَلِيمٌ ﴿٢٦٣﴾ يَٰٓأَيُّهَا ٱلَّذِينَ ءَامَنُوا۟ لَا تُبْطِلُوا۟ صَدَقَٰتِكُم بِٱلْمَنِّ وَٱلْأَذَىٰ كَٱلَّذِى يُنفِقُ مَالَهُۥ رِئَآءَ ٱلنَّاسِ وَلَا يُؤْمِنُ بِٱللَّهِ وَٱلْيَوْمِ ٱلْءَاخِرِۖ فَمَثَلُهُۥ كَمَثَلِ صَفْوَانٍ عَلَيْهِ تُرَابٌ فَأَصَابَهُۥ وَابِلٌ فَتَرَكَهُۥ صَلْدًاۖ لَّا يَقْدِرُونَ عَلَىٰ شَىْءٍ مِّمَّا كَسَبُوا۟ۗ وَٱللَّهُ لَا يَهْدِى ٱلْقَوْمَ ٱلْكَٰفِرِينَ ﴿٢٦٤﴾﴾

## ڕێگری لە بەچاودانەوەو ئازاردانی خەڵك لە ماڵ بەخشیندا

خودای مەزن ستایشی ئەو كەسانە دەكات كە ماڵی خۆیان لە ڕێی خوادا دەبەخشن ، پاشان منەت بەسەر كەسدا ناكەن لەسەر ئەو ماڵەی پێی دەبەخشێ، نە بە قسەو نە بە كردار. ﴿يُنفِقُونَ أَمْوَٰلَهُمْ فِى سَبِيلِ ٱللَّهِ ثُمَّ لَا يُتْبِعُونَ مَآ أَنفَقُوا۟ مَنًّا وَلَآ أَذًى﴾ ئەو كەسانەی ماڵ لە ڕێی خوادا دەبەخشن‌و نایدەنەوە بە نێوچاوانیانداو بەوە ئازاریان نادەن. واتە: لەگەڵ ئەو چاكەو ماڵ بەخشینەدا خراپەیان لەگەڵدا ناكەن، تا ئەوەی كە كردویانە دەربارەیان بەتاڵی كەنەوە، خودا بەڵێنی پاداشتی باشی پێداون ﴿لَّهُمْ أَجْرُهُمْ عِندَ رَبِّهِمْ وَلَا خَوْفٌ عَلَيْهِمْ وَلَا هُمْ يَحْزَنُونَ﴾ پاداشتی خۆیان لەلای پەروەردگاریان وەردەگرن‌و هیچ ترسێكیان لەسەر نیە. لە ڕۆژی قیامەتدا ﴿وَلَا هُمْ يَحْزَنُونَ﴾ خەمیش ناخۆن، واتە: بۆ ئەو منداڵانەش كە لە دوای خۆیان بەجێیان هێشتوون، خەمیش ناخۆن بۆ ئەو خۆشیانەی لە دنیا لەدەستیان چووە. چونكە چوونەتە شوێنێ كە زۆر چاكترو باشترە لەوەی كە بەجێیان هێشتووە. پاشان خودای گەورە دەفەرموێت: ﴿قَوْلٌ مَّعْرُوفٌ وَمَغْفِرَةٌ﴾ قسەی نەرم‌و نیان‌و چاوڵێ پۆشین ﴿خَيْرٌ

---

[1] أحمد (٢/٤٤٣)، سەحیحە.

مِّن صَدَقَةٍ يَتْبَعُهَآ أَذًى ﴾ لەو خێر کردنە چاکترە کە ئازاری بە شوێنا بێ، بە قسە یا بە کردار. ﴿وَٱللَّهُ غَنِيٌّ حَلِيمٌ﴾ خودا بێ نیازە (لە دروستکراوەکانی) هێدیو لەسەرخۆیەو چاوپۆشی دەکاو لێبوردەو خاوەن بەزەییە. فەرموودە زۆر هاتووە لەسەر منەت کردن بەسەر خەڵکیدا لەسەر ماڵ بەخشین پێیان، لە سەحیحی موسلیمدا هاتووە لە ئەبوزەڕەوە: پێغەمبەری خودا(ﷺ) فەرموویەتی: (سێ کەس هەن، خوا لە ڕۆژی قیامەتدا نایان دوێنێو سەیریان ناکاولەگوناە پاکیان ناکاتەوەو سزای سەختیان هەیە، ئەو کەسەی منەت بەسەر خەڵکدا دەکات بەوەی پێی داوە، ئەو کەسەی پۆشاکەکەی درێژ دەکات بۆ دامێنی پێی (بەمەبەستی فیز کردن) ئەو کەسەی بە سوێندی درۆ ڕواج بە شتومەکەکەی دەدات).[1] هەر بۆیە خودای مەزن دەفەرمووێت: ﴿يَٰٓأَيُّهَا ٱلَّذِينَ ءَامَنُواْ لَا تُبۡطِلُواْ صَدَقَٰتِكُم بِٱلۡمَنِّ وَٱلۡأَذَىٰ﴾ ئەی ئەو کەسانەی کە خاوەنباوەڕن، خێرەکانتان بە منەت لەسەر کردنو ئازاردان بەتاڵ مەکەنەوە. خودای مەزن ئاگاداری داوە کە ماڵبەخشین بە منەت کردن خێری نامێنێو خاوەنەکەی بەو تاوانە هەرچی کردوە لەدەستی ئەدات. پاشان دەفەرمووێت: ﴿كَٱلَّذِي يُنفِقُ مَالَهُۥ رِئَآءَ ٱلنَّاسِ﴾ وەك ئەوەی بۆ ڕووبینی لە ماڵی خۆی دەبەخشێ. وای نیشان ئەدان لەبەر ڕەزای خوا دەیبەخشێ، بەڵام لە ڕاستیدا بۆیە دەیبەخشێ تاخەڵکی ستایشی بکەنو باسی پیاوچاکیو بەخشندەیی بکەن. یان پێی بڵێن پیاوێکی بەخشندەو چاکە، بێ ئەوەی بیر لەوە بکاتەوە کە خودا ئاگای لێیەتیو ڕەزامەندی خواو پاداشتی ئەو زۆر باشترە لە ستایشی خەڵکی، بۆیە دەفەرمووێت: ﴿وَلَا يُؤۡمِنُ بِٱللَّهِ وَٱلۡيَوۡمِ ٱلۡأٓخِرِ﴾کەسی وا بڕوای بە خوداو ڕۆژی دوایی نیە. پاشان خودای گەورە نمونەی ئەو کەسانە کە ماڵ دەبەخشن بۆ ڕووبینی (زەحاك وتوویەتی: ئەو کەسەی بە دوای ماڵ بەخشینەکەیدا منەت دەکاو ئازاری خەڵکی پێ ئەدات)[2] دەفەرمووێت: ﴿فَمَثَلُهُۥ كَمَثَلِ صَفۡوَانٍ﴾ ئەم کەسە وەك تاتەبەردێکی زۆر لووس وایە[3]. ﴿عَلَيۡهِ تُرَابٞ فَأَصَابَهُۥ وَابِلٞ فَتَرَكَهُۥ صَلۡدٗا﴾ هەندێ خۆڵی لەسەر بێ، باو بارانێکی بەتاو توند لێی بداتو بیشواتەوەو هەر بە ڕووتی بمێنێتەوە. واتە: ئەو باو بارانە ئەو تاتە بەردە بشواتەوەو بە سافیو وشکی بمێنێتەوەو هیچ خۆڵی بەسەرەوە نەمێنێ. هەر بەو

---

[1] مسلم (١٠٢/١).

[2] الطبري (٥٢٧/٥).

[3] (صفوان) کۆی (صفوانة) هەندێکیش دەڵێن: (الصفوان) بە (مفرد) بەکاردێت، کە (الصفا)یە. یانی بەردی لووس

شێوەیە کرداری ئەوانە دەڕواو لە لای خوا پوچەڵ دەبێتەوە، با واش بزانێ چاکە خواز بووە، وەك ئەو خۆڵەی لێ دێ کە بەسەر بەردی سافەوەیە باو باران لێی بدا بیشواتەوە، ﴿لَّا يَقْدِرُونَ عَلَىٰ شَيْءٍ مِّمَّا كَسَبُوا ۗ وَاللَّهُ لَا يَهْدِي الْقَوْمَ الْكَافِرِينَ﴾ هیچ سودێکیان لەو بەخشینە دەسگیر نابێ‌و خودا کۆمەڵی خوانەناسان لە ڕێگە شارەزا ناکات.

﴿وَمَثَلُ الَّذِينَ يُنفِقُونَ أَمْوَالَهُمُ ابْتِغَاءَ مَرْضَاتِ اللَّهِ وَتَثْبِيتًا مِّنْ أَنفُسِهِمْ كَمَثَلِ جَنَّةٍ بِرَبْوَةٍ أَصَابَهَا وَابِلٌ فَآتَتْ أُكُلَهَا ضِعْفَيْنِ فَإِن لَّمْ يُصِبْهَا وَابِلٌ فَطَلٌّ ۗ وَاللَّهُ بِمَا تَعْمَلُونَ بَصِيرٌ (٢٦٥)﴾

نموونەی ئەو خاوەن باوەڕانەش کە ماڵ‌و سامانی خۆیان لەبەر ڕەزامەندی خودای مەزن ئەبەخشن ﴿وَمَثَلُ الَّذِينَ يُنفِقُونَ أَمْوَالَهُمُ ابْتِغَاءَ مَرْضَاتِ اللَّهِ وَتَثْبِيتًا مِّنْ أَنفُسِهِمْ﴾ ئەو کەسانە بەهیوان خودا لە خۆیان ڕازیی بکەن و، دڵیان بە بڕوا بتەو بێ. واتە: بێگومانن کە خودا زۆر بە چاکی بەو زوانە پاداشتیان ئەداتەوە، لە نموونەی ئەم ئایەتە لە فەرموودەی سەحیحی پێغەمبەردا (ﷺ) هاتووە فەرموویەتی: (هەرکەسێ ڕۆژوی ڕەمەزان بگرێ بە بڕوایەکی پتەوو بە هیوای پاداشتی خودا بێ)[1] واتە: بڕوای وابێ کە خودا دایناوەو بەتەمای پاداشتی خودا بێ بەو ڕۆژوو گرتنە. پاشان خودای گەورە دەفەرمووێت: ﴿كَمَثَلِ جَنَّةٍ بِرَبْوَةٍ﴾ خێرەکەیان وەك باغێکە لەسەر گردێك. لە لای کۆی زانایان (الجمهور) واتە: شوێنی بەرزی تەخت لەسەر زەمیندا. ئیبنوعەبباس‌و زەحاك ئەمەیان بۆ زیاد کردووە، ڕووبار بە ناویدا بڕوات.[2] ﴿أَصَابَهَا وَابِلٌ فَآتَتْ أُكُلَهَا ضِعْفَيْنِ﴾ بارانی پەڵە لێی بداو بەروبوومی دوو ئەوەندە بێ. واتە: بارانی توندو زۆر لێی بداتو بەروبوومی لە باغەکانی تر زیاتر بێ ﴿فَإِن لَّمْ يُصِبْهَا وَابِلٌ فَطَلٌّ﴾ ئەگەر پەڵەو بارانی زۆریش لێی نەدا، نمە باران تێر ئاوی بکا..[3] ئا ئەم باغە بەم گردەوە هرگیز نابێتە قوڕو لیتە. چونکە ئەگەر بارانی زۆر لێی نەدا، نمەباران‌و شەونم هەر لێی ئەدات، هەر کامیان بێت هەر بەسیەتی، کرداری خاوەن باوەڕیش هەرگیز لەناو ناچێ، بەڵکو خودا لێی وەردەگرێ‌و گەشەی پێ دەکا، هەرکەسەویەپێی خۆی. بۆیە خودای گەورە دەفەرمووێت: ﴿وَاللَّهُ بِمَا تَعْمَلُونَ بَصِيرٌ﴾ هەر کارێ ئێوە دەیکەن خودا دەیبینێ. خودا هیچ کارێکی بەندەکانی لێ ون نابێ.

---

[1] فتح الباري (٤/٣٠٠).

[2] الطبري (٥/٥٣٧).

[3] الطبري (٥/٥٣٩). زەحاك وتی: ﴿فَطَلٌّ﴾ نمە بارانی لەسەرخۆ لێی بدا.

﴿ أَيَوَدُّ أَحَدُكُمْ أَن تَكُونَ لَهُۥ جَنَّةٌ مِّن نَّخِيلٍ وَأَعْنَابٍ تَجْرِى مِن تَحْتِهَا ٱلْأَنْهَٰرُ لَهُۥ فِيهَا مِن كُلِّ ٱلثَّمَرَٰتِ وَأَصَابَهُ ٱلْكِبَرُ وَلَهُۥ ذُرِّيَّةٌ ضُعَفَآءُ فَأَصَابَهَآ إِعْصَارٌ فِيهِ نَارٌ فَٱحْتَرَقَتْ كَذَٰلِكَ يُبَيِّنُ ٱللَّهُ لَكُمُ ٱلْءَايَٰتِ لَعَلَّكُمْ تَتَفَكَّرُونَ ﴿٢٦٦﴾ ﴾

**وێنەی لەناوچوونی چاکە بە خراپە**

بوخاری ڕیوایەتی کردوە، لە تەفسیری ئەم ئایەتەدا لە ئیبنوعەبباس و عوبەیدەی کوڕی عومەیرەوە کە ڕۆژێ عومەری کوڕی خەتاب بە هاوەڵەکانی پێغەمبەری وت (ﷺ): چۆن لەم ئایەتە تێدەگەن کە هاتۆتە خوارەوە؟ ﴿ أَيَوَدُّ أَحَدُكُمْ أَن تَكُونَ لَهُۥ جَنَّةٌ مِّن نَّخِيلٍ وَأَعْنَابٍ تَجْرِى مِن تَحْتِهَا ٱلْأَنْهَٰرُ لَهُۥ فِيهَا مِن كُلِّ ٱلثَّمَرَٰتِ ﴾ کێتان حەز دەکات ببێتە خاوەنی باغێك لە گشت جۆرە خورماو ڕەزێك و جۆبار بەناویدا بڕواو هەمووشیان هاتبنە بەر. وتیان: خودا باشتر دەزانێ. عومەر تووڕە بوو، وتی: بڵێن دەزانین یا نازانین. ئیبنوعەبباس وتی: ئەی گەورەی موسوڵمانان، لە دڵی مندا شتێك هەیە، عومەر وتی ئەی برازای خۆم بیڵێ: خۆت بە کەم مەزانە. ئیبنوعەبباس (ڕەزای خوای لێ بێ) وتی: ئەم نموونەیە بۆ کارکردن هێنراوەتەوە. عومەر وتی: چ کارێ؟ ئیبنوعەبباس وتی: بۆ پیاوێکی دەوڵەمەندە بە گوێڕایەڵی خودا کاری کردوە، پاشان خودا شەیتانێکی بۆ ناردوەو تاوانی پێ کردوە هەتا کارەکانی نغرۆ کردوەو لەناوی بردووە.[1] ئەم فەرموودەیە بەسە بۆ تەفسیری ئەم ئایەتە، نموونەیەکی هێناوەتەوە بە کەسێ کە لە سەرەتاوە کاری چاکی کردوە، پاشان دوای ئەوە بە پێچەوانەوە کاری کردوە، چاکەکانی خۆی گۆڕیوە بە خراپەو تاوان. پەنا بە خوا لەو کارە. بە کرداری دووهەمی، هەر کارێکی چاکی لە پێشدا کردوە بەتاڵی کردۆتەوە، کە زۆر پێویستی بەو کارەی پێشووی هەیە لە کاتی تەنگانەدا، بەڵام هیچ سودێکی لێ وەرناگرێ لەو کاتەدا کە ئەو پێویستی پێیەتی. لەبەر ئەوەی خودای مەزن دەفەرموێت: ﴿وَأَصَابَهُ ٱلْكِبَرُ وَلَهُۥ ذُرِّيَّةٌ ضُعَفَآءُ فَأَصَابَهَآ إِعْصَارٌ فِيهِ نَارٌ فَٱحْتَرَقَتْ ﴾ پیری بڕستی بڕیبێ و منداڵی سەروپێچکەی هەبێ، لەناکاو گڕەبایەك لێی هەڵکاو بیسوتێنێ؟ واتە: بایەکی توندو بەهێز لە باغەکەی هەڵکاو بیسوتێنێ و هەموو درەختەکانی لەناوبەرێت. حاڵی ئەو کەسە چ حاڵێکە لەو کاتەدا؟ ئیبنوئەبی حاتەم ڕیوایەتی کردوە لە ڕێگەی عەوفیەوە لە ئیبنوعەبباسەوە وتی: خودای مەزن نمونەیەکی چاکی هێناوەتەوە، گشت نموونەکانی خودا چاکن، کە دەفەرموێت: ﴿ أَيَوَدُّ أَحَدُكُمْ أَن تَكُونَ لَهُۥ جَنَّةٌ مِّن نَّخِيلٍ وَأَعْنَابٍ تَجْرِى مِن تَحْتِهَا ٱلْأَنْهَٰرُ لَهُۥ فِيهَا مِن كُلِّ ٱلثَّمَرَٰتِ ﴾

---

[1] فتح الباري (٨/٤٩).

ماڵ وێرانی لە کاتی پیریدا، منداڵەکانیش وردو لاوازو سەرەپێچکە، گرەبایەکی توند ڕوو بەباغەکەی هەڵکاو بیسوتێنێ، تواناشی نەمابێ جارێکی تر باغێکی وا بنێژێت. منداڵەکانیشی ئەوەندە چاك نەبن ئەو باغە وەك خۆی لێ بکەنەوە، خوانەناس لە ڕۆژی قیامەتدا کاتێ کە دەگەڕێتەوە بۆ لای خودا وەك ئەوە وایە چاکەیەکی نیە تا بیکاتە بەهانەو بیانوو. تواناشی نەماوە باغێکی تر بنێژێ وەك باغەکەی‌و هیچ چاکەیەکی خۆی نابینێ کە پێش خۆیی خستبێ‌و بەهیوای بێ، منداڵەکانیشی لێرەدا هیچ فریای ناکەون، لە کاتی ئەم داماویەدا کە پێویستی بە کەمترین شت هەبوو، وەك چۆن ئەم بەهەشتەی خودای لە خۆی حەرام کرد کە زۆر پێویستی پێی بوو لە کاتی پیری‌و لاوازی‌و منداڵی سەرەپێچکەدا.[1] حاکیم ڕیوایەتی کردوە لە موستەدرەکەکەیدا کە پێغەمبەری خودا (ﷺ) لە نزاکانیدا ئەیفەرموو: (ئەی خودایە! فراوانی ڕۆزیم بخەرە کاتی تەمەن درێژی‌و کۆتایی تەمەنم)[2] هەر بۆیە خودای گەورە دەفەرمووێت: ﴿كَذَٰلِكَ يُبَيِّنُ اللَّهُ لَكُمُ الْآيَاتِ لَعَلَّكُمْ تَتَفَكَّرُونَ﴾ خودا ئاوا نیشانەکانی پێشچاوی ئێوەنەخات، بەڵکو بیری لێ بکەنەوە. واتە: هەتا پەندو ئامۆژگاری لێ وەرگرن‌و لە نموونەو ماناکانی تێبگەن و لە شوێنی خۆیدا دایبنێن. وەك خودای گەورە لە ئایەتێکی ترا دەفەرمووێت: ﴿وَتِلْكَ الْأَمْثَالُ نَضْرِبُهَا لِلنَّاسِ ۖ وَمَا يَعْقِلُهَا إِلَّا الْعَالِمُونَ﴾[3] ئەم نموونانە بۆ خەڵك دێنینەوەو زانایان نەبێ، تێی ناگەن.

﴿يَا أَيُّهَا الَّذِينَ آمَنُوا أَنفِقُوا مِن طَيِّبَاتِ مَا كَسَبْتُمْ وَمِمَّا أَخْرَجْنَا لَكُم مِّنَ الْأَرْضِ ۖ وَلَا تَيَمَّمُوا الْخَبِيثَ مِنْهُ تُنفِقُونَ وَلَسْتُم بِآخِذِيهِ إِلَّا أَن تُغْمِضُوا فِيهِ ۚ وَاعْلَمُوا أَنَّ اللَّهَ غَنِيٌّ حَمِيدٌ (٢٦٧) الشَّيْطَانُ يَعِدُكُمُ الْفَقْرَ وَيَأْمُرُكُم بِالْفَحْشَاءِ ۖ وَاللَّهُ يَعِدُكُم مَّغْفِرَةً مِّنْهُ وَفَضْلًا ۗ وَاللَّهُ وَاسِعٌ عَلِيمٌ (٢٦٨) يُؤْتِي الْحِكْمَةَ مَن يَشَاءُ ۚ وَمَن يُؤْتَ الْحِكْمَةَ فَقَدْ أُوتِيَ خَيْرًا كَثِيرًا ۗ وَمَا يَذَّكَّرُ إِلَّا أُولُو الْأَلْبَابِ (٢٦٩)﴾

### هاندان بۆ بەخشینی ماڵی چاك‌و پاك لە ڕێی خوادا

خودای مەزن فەرمان دەکات بە عەبدە خاوەن باوەڕەکانی بە ماڵ بەخشین، مەبەست پێی لێرەدا ماڵی زەکاتە. ئیبنوعەبباس وتی: لە چاکترین ماڵێ کە خودا پێیداون‌و لە بەروبووم‌و کشتوکاڵێ کە خودا لە زەویدا بۆی ڕواندون، ئیبنوعەبباس وتی: خودا فەرمانی پێداون لە چاکترین‌و پاکترین ماڵتان ببەخشن، لێی قەدەغە کردون کە ماڵی خراپ‌و بێ نرخ ببەخشن، چونکە خودا پاك‌و بێگەردەو ماڵی

---

[1] إبن أبي حاتم غ: (٣/١٠٧٤).

[2] الحاكم (١/٥٤٢)، فەرموودەیەکی زۆر لاوازە.

[3] العنكبوت (٤٣).

چاكو پاك نەبێ وەری ناگرێ، هەر بۆیە دەفەرموێت: ﴿يَٰٓأَيُّهَا ٱلَّذِينَ ءَامَنُوٓاْ أَنفِقُواْ مِن طَيِّبَٰتِ مَا كَسَبۡتُمۡ وَمِمَّآ أَخۡرَجۡنَا لَكُم مِّنَ ٱلۡأَرۡضِۖ وَلَا تَيَمَّمُواْ ٱلۡخَبِيثَ مِنۡهُ تُنفِقُونَ﴾ ئەی ئەو كەسانەی خاوەن باوەڕن، لەو شتانەی كە لە زەمین پێمان داونو پەیدای دەكەن ببەخشن، مەچن لەوە ببەخشن كە خراپە. ﴿وَلَسۡتُم بِـَٔاخِذِيهِ﴾ كە خۆشتان ناتانەوێ، واتە: ئەگەر ئەو شتە بە خۆتان بدرێ وەری ناگرن. ﴿إِلَّآ أَن تُغۡمِضُواْ فِيهِ﴾ ئەگەر چاوپۆشی لێ نەكەن. خودا لەوە بێ نیازە كە دەیبەخشن. شتێ مەدەن بە خودا كە خۆتان حەزتان لێی نیە. هەندێ دەڵێن: ئەم ئایەتە: ﴿وَٱعۡلَمُوٓاْ أَنَّ ٱللَّهَ غَنِيٌّ حَمِيدٌ﴾ واتە: لە ماڵی حەلاڵ لامەدەنو هەوڵی ماڵی حەرام بدەن و بژێویتان لەو ماڵە حەرامە بێ. ئیبنوجەریر ڕیوایەتی كردوە لە بەرائی كوڕی عازیبەوە (ڕەزای خوای لێ بێ) لەم ئایەتەدا: ﴿يَٰٓأَيُّهَا ٱلَّذِينَ ءَامَنُوٓاْ أَنفِقُواْ مِن طَيِّبَٰتِ مَا كَسَبۡتُمۡ وَمِمَّآ أَخۡرَجۡنَا لَكُم مِّنَ ٱلۡأَرۡضِۖ وَلَا تَيَمَّمُواْ ٱلۡخَبِيثَ مِنۡهُ تُنفِقُونَ﴾ وتی: لەسەر ئەنساریەكان هاتۆتە خوارەوە، ئەنساریەكان لە كاتی بڕینی خورمادا لە دیوارەكانیانەوە بۆشكە خورمایان دەردەكرد بە پەتێكەوە لە نێوان دوو ئیستیوانەدا هەڵیان دەواسی لە مزگەوتی پێغەمبەرا (ﷺ) كۆچەریە هەژارەكان لێیان دەخوارد، كەسی وایان هەبوو خورمای خراپی دەهێناو دەیخستە ناو ئەو خورما هەڵواسراوانە، وای دەزانی دروستە. خودای مەزن ئەم ئایەتەی لەسەر ئەوانە ناردە خوارەوە كە وا دەكەنو دەفەرموێت: ﴿وَلَا تَيَمَّمُواْ ٱلۡخَبِيثَ مِنۡهُ تُنفِقُونَ﴾[1] مەڕۆن لەوەی ببەخشن كە خراپە. عەلی كوڕی ئەبوتەلحە وتی: لە ئیبنوعەبباسەوە، ﴿وَلَسۡتُم بِـَٔاخِذِيهِ إِلَّآ أَن تُغۡمِضُواْ فِيهِ﴾ وتی: واتە: ئەگەر كەسێ لە ئێوە هەقێكی هەبێ، ئەو هەقەی بۆ هێنانەوە كەمتر لە خۆتان. هەرگیز بە حیسابی چاك وەری ناگرن هەتا لێی دانەشكێنن. ئەمەیش ئەوەیە كە خودای مەزن دەفەرموێت: ﴿إِلَّآ أَن تُغۡمِضُواْ فِيهِ﴾ ئەگەر چاوپۆشی لێ نەكەن. كەواتە چۆن بە شتێ ڕازی دەبن بۆ من كە بۆ خۆتان پێی ڕازی نابن. كە حەقی من بەسەر ئێوەوە دەبێ لە چاكترینو بەنرخو بەها تر بێ؟ ئیبنوئەبی حاتەمو ئیبنوجەریر ڕیوایەتیان كردوە ئەمەیان بۆ زیاد كردوە. كە خودای گەورە دەفەرموێت: ﴿لَن تَنَالُواْ ٱلۡبِرَّ حَتَّىٰ تُنفِقُواْ مِمَّا تُحِبُّونَ﴾[2]،[3] تا لەو شتەی كە ئێوە خۆشتان دەوێ، لە ڕێی خوادا نەبەخشن

---

[1] الطبري (٥/٥٥٩).

[2] آل عمران (٩٢).

[3] إبن أبي حاتم غ: (١٠٨٨/٣)، الطبري (٥/٥٦٥).

، هەرگیز بە خێرو چاکە ناگەن. پاشان خودای گەورە دەفەرموویێت: ﴿وَٱعْلَمُوٓا۟ أَنَّ ٱللَّهَ غَنِىٌّ حَمِيدٌ﴾ بشزانن خودا نیازی بە کەس نیەو هەر دەبێ ستایش بکرێ. واتە: کە خودا فەرمانتان پێدەکا بە ماڵ بەخشینو بە ماڵی چاکیش، بێگومان خودا پێویستی بەو ماڵەی ئێوە نیە. ئەمە هەر بۆ ئەوەیە جیاوازی لە نێوان هەژارو دەوڵەمەندا نەمێنێ. وەك خودای گەورە دەفەرموویێت: ﴿لَن يَنَالَ ٱللَّهَ لُحُومُهَا وَلَا دِمَآؤُهَا وَلَٰكِن يَنَالُهُ ٱلتَّقْوَىٰ مِنكُمْ﴾[1] گۆشتو خوێنی ئەوانە بۆ خوا ناچێ، تەنیا هەستی ترس لە خوایە بەو دەگا. خودا بێ نیازە لە هەموو دروس کراوەکانی، گشت وەدی هێنراوەکانی پێویستیان بەو هەیە، بەخشندەیی ئەو زۆر فراوانە، ئەوەی لای ئەوە هەرگیز تەواو نابێ. هەرکەسێ خێرێ بکا لە ماڵێکی پاکو حەلاڵ، با چاك بزانێ خودا دەوڵەمەندەو بەخششی ئێجگار فراوانەو زۆری پێ ناچێ پاداشتی ئەداتەوە بە چەند قات لەوەی کە بەخشیویەتیو زۆر زیاتریش. هەر خودا شایەنی ستایشە، واتە: سوپاسو ستایش کراوە لە هەموو کردارو گوفتارو بەرنامەو بڕیارو فەرمانیدا، هیچ پەرستراوو پەروەردگاریە نیە بێجگەلەئەو.

## وەسوەسە شەیتانیەکان لە ماڵ بەخشیندا

خودای مەزن دەفەرموویێت: ﴿ٱلشَّيْطَٰنُ يَعِدُكُمُ ٱلْفَقْرَ وَيَأْمُرُكُم بِٱلْفَحْشَآءِ ۖ وَٱللَّهُ يَعِدُكُم مَّغْفِرَةً مِّنْهُ وَفَضْلًا ۗ وَٱللَّهُ وَٰسِعٌ عَلِيمٌ﴾ شەیتان ئێوە لە هەژاری دەترسێنێو بۆ خراپە هانتان ئەدات، خودایش بەڵێنی لێ خۆش بوونو خۆشی ژیانتان پێدەدا، فەرمانی وا لەلای خودایەو خۆی زانایە. ئیبنوئەبی حاتەم ڕیوایەتی کردوە لە عەبدوڵلای کوڕی مەسعودەوە، وتی: پێغەمبەری خودا (ﷺ) فەرموویەتی: (بێگومان شەیتان نزیکە لە نەوەی ئادەمەوەو فریشتەیش هەر نزیکە لێیەوە، نزیکی شەیتان بەڵێن پێدانە بە خراپەو بڕوا نەکردنە بە هەق، بەڵام نزیکی فریشتە بەڵێن پێدانە بە چاکەو بڕوا کردنە بە هەق، هەرکەسێ ئەوەی دی، باش بزانێ کە ئەوە لە خواوەیەو سوپاسو ستایشی خوا بکات. هەرکەسیش ئەوی تری دی با پەنا بگرێ بە خودا لە شەیتان) پاشان ئەم ئایەتەی خوێند: ﴿ٱلشَّيْطَٰنُ يَعِدُكُمُ ٱلْفَقْرَ وَيَأْمُرُكُم بِٱلْفَحْشَآءِ ۖ وَٱللَّهُ يَعِدُكُم مَّغْفِرَةً مِّنْهُ وَفَضْلًا ۗ وَٱللَّهُ وَٰسِعٌ عَلِيمٌ﴾ هەر بەم شێوەیە تیرمیزیو نەسائی ڕیوایەتیان کردوە لە سونەنەکەیاندا مانای ئەم ئایەتە کە خودای گەورە دەفەرموویێت: ﴿ٱلشَّيْطَٰنُ يَعِدُكُمُ ٱلْفَقْرَ﴾ واتە: شەیتان دەتانترسێنێ بە هەژاری تا ئەوەی لە دەستتاندایە توند بیگرنو هیچی لێ نەبەخشن لە ڕێی خواو پەزامەندی ئەودا ﴿وَيَأْمُرُكُم

---

[1] الحج (٣٧).

﴿بِٱلْفَحْشَآءِ﴾ واتە: لەگەڵ ڕێگری کردنی لە بەخشین لە ترسی هەژاری، فەرمانیشتان پێدەکات بە تاوان‌وخراپەکاری‌و شکاندنی سنورەکانی خوداو سەرپێچی ئەو، ﴿وَٱللَّهُ يَعِدُكُم مَّغْفِرَةً مِّنْهُ﴾ بەڵام: لە بەرانبەری ئەوەی کە شەیتان فەرمانتان پێدەکا بە خراپە، خودا بەڵێنی لێخۆش بوون و ﴿وَفَضْلًا﴾ خۆشی ژیانتان پێدەدات. ﴿وَٱللَّهُ وَٰسِعٌ عَلِيمٌ﴾ توانای خوا فراوانە و خۆی زانایە.

**ماناى لەكارزانی**

﴿يُؤْتِى ٱلْحِكْمَةَ مَن يَشَآءُ ۚ وَمَن يُؤْتَ ٱلْحِكْمَةَ فَقَدْ أُوتِىَ خَيْرًا كَثِيرًا ۗ وَمَا يَذَّكَّرُ إِلَّآ أُو۟لُوا۟ ٱلْأَلْبَٰبِ﴾ (خودا) لەکارزانی ئەدات بە هەرکەسێ بیەوێ، بە هەرکەسیش لەکارزانی بدرێ ئەوە خێرێ زۆری پێدراوە. عەلی کوڕی ئەبوتەلحە لە ئیبنوعەبباسەوەوتوویەتی: واتە: زانیاری بە قورئانی پیرۆز بە ناسخ‌و مەنسوخ‌و محکەم‌و متەشابەو هەوەڵ‌و ئاخری‌و حەڵاڵ‌و حەرام‌و نموونەکانیەوە، ئیمامی ئەحمەد ڕیوایەتی کردوە لە ئیبنومەسعودەوە، لە پێغەمبەری خوداوەم بیست (ﷺ) ئەیفەرموو: (ئیرەیی (حەسوودی) ڕێی پێ نادرێ مەگین لە دوو شتا: پیاوێك خودا ماڵ‌و سامانێکی پێدابێ‌و سەرکەوتوی کردبێ لە خەرجکردنیا لە پێناو هەقدا. پیاوێکیش خودا کارزانیەکی (الحكمة) پێدابێ فەرمانی پێبکات لە کارزانیداو خێریشی ببێ)[1] هەر بەم شێوەیە بوخاری‌و موسلیم‌و نەسائی‌و ئیبنوماجە ڕیوایەتیان کردوە[2]، پاشان خودای گەورە دەفەرمووێت: ﴿وَمَا يَذَّكَّرُ إِلَّآ أُو۟لُوا۟ ٱلْأَلْبَٰبِ﴾ ئامۆژگاریش بەهرە نادا مەگەر بۆ ئەوانەی خاوەن هۆش‌و ئاوەزن‌و لەو قسانە تێدەگەن‌و مانای قسە دەزانن.

﴿وَمَآ أَنفَقْتُم مِّن نَّفَقَةٍ أَوْ نَذَرْتُم مِّن نَّذْرٍ فَإِنَّ ٱللَّهَ يَعْلَمُهُۥ ۗ وَمَا لِلظَّٰلِمِينَ مِنْ أَنصَارٍ ﴿٢٧٠﴾ إِن تُبْدُوا۟ ٱلصَّدَقَٰتِ فَنِعِمَّا هِىَ ۖ وَإِن تُخْفُوهَا وَتُؤْتُوهَا ٱلْفُقَرَآءَ فَهُوَ خَيْرٌ لَّكُمْ ۚ وَيُكَفِّرُ عَنكُم مِّن سَيِّـَٔاتِكُمْ ۗ وَٱللَّهُ بِمَا تَعْمَلُونَ خَبِيرٌ ﴿٢٧١﴾﴾

﴿وَمَآ أَنفَقْتُم مِّن نَّفَقَةٍ أَوْ نَذَرْتُم مِّن نَّذْرٍ فَإِنَّ ٱللَّهَ يَعْلَمُهُۥ ۗ وَمَا لِلظَّٰلِمِينَ مِنْ أَنصَارٍ﴾ هەر ماڵێك کە دەیکەنە خێر، یان هەر نەزرێك کە بۆ خودای دەکەن، خودا پێی دەیزانێ، ئەوانەی خوانەناسن هیچ یارمەتیدەرێکیان نیە. خودای مەزن ئاگاداری ئەدات کە هەر کارێ هەرکەسێ دەیکات ئەو بەئاگایە لە هەر چاکەیەك جاماڵ بەخشینبێ یان نەزر کردن، بڕیاری خۆشیەتی کە بە چاکترین

[1] أحمد (٤٣٢/١)، سەحیحە.

[2] فتح الباري (١٩٩/١)، مسلم (٥٥٩/١)، النسائي في الكبرى (٤٢٦/٣)، إبن ماجة (١٤٠٧/٢).

شێوە پاداشتی ئەو کەسانە ئەداتەوە کە لەبەر ڕەزامەندی ئەو چاکەیان کردوەو بە تەمای پاداشتی ئەو بوون. هەڕەشەیش لەو کەسانە دەکات کە بە فەرمانی ئەویان نەکردووەو بەڵکو سەرپێچیان کردوەو بڕوایان بە بەڵێنەکانی نەبووەو لەگەڵیدا شتی تریان پەرستوە، دەفەرمووێت: ﴿وَمَا لِلظَّٰلِمِينَ مِنْ أَنصَارٍ﴾ ئەوانەی خوانەناسن هیچ یارمەتیدەرێکیان نیە، لە ڕۆژی قیامەتدا لە سزاو تۆڵەی خودا ڕزگاریان بکات.

## ڕێزی بە ئاشکرا خێر کردن و بە نهێنیشی

خودای مەزن دەفەرمووێت: ﴿إِن تُبْدُوا۟ ٱلصَّدَقَٰتِ فَنِعِمَّا هِىَ﴾ ئەگەر بە ئاشکرا خێر بکەن کارێکی چاکە. ﴿وَإِن تُخْفُوهَا وَتُؤْتُوهَا ٱلْفُقَرَآءَ فَهُوَ خَيْرٌ لَّكُمْ﴾ خۆ ئەگەر بە نهێنیش بیۆ دەستی هەژاری پێ بگەیێ باشتریشە. ئەم ئایەتە دەری دەخات کە خێر کردن بە نهێنی چاکترە لە بە ئاشکراکردنی، چونکە لە ڕیا کردن دوورت دەخاتەوە، ئەگەر ئەو خێرکردنە بە ئاشکرا لەو کاتەدا بەرژەوەندیەکی گرنگتری تێدا بێ، بۆ ئەوەی خەڵکی تریش چاوی لێ بکەن لەو کارە خێرەدا ئا لەم شێوەیەدا بە ئاشکرا چاکترە. پێغەمبەری خودا (ﷺ) فەرموویەتی: (ئەوەی بە ئاشکرا قورئان (دەخوێنێ) وەک ئەو کەسە وایە کە بە ئاشکرا خێر دەکات. ئەویش بە نهێنی قورئان (دەخوێنێ) وەک ئەو کەسە وایە بە نهێنی خێر دەکات)[1] بە پێی ئایەتە کە بە نهێنی خێر کردن چاکترە لە بە ئاشکرا کردنی. وەک لەم فەرموودە سەحیحەیشدا هاتووە لە ئەبوهورەیرەوە: پێغەمبەری خودا (ﷺ) فەرموویەتی: (حەوت کۆمەڵ خودا دەیانخاتە ژێر سێبەری خۆیەوە، لە ڕۆژێکدا کە جگە لە سێبەری خۆی سێبەری تر نیە، لەوانە: پێشەوایەکی دادپەروەر، لاوێك لەسەر خواپەرستی گەورە بوبێت، کەسێك کە دڵی پەیوەستی مزگەوت بێت، دوو کەس کە لەبەر خودا یەکتریان خۆش بوێت و لەسەر ئەو بنچینەیە بەیەك گەیشتبن، دوای دوور کەوتنەوەو جیابونەوەشیان لە یەکتر خۆشەویستیان بەردەوام بێت، کەسێك کە ئافرەتێکی جوان و ناودار بانگی بکات، ئەویش بڵێت: بەڕاستی من لە خودا دەترسم، کەسێك کە خێر دەکات و دەیشارێتەوە هەتا دەستی ڕاستی نازانێت دەستی چەپی چی بەخشیوە. کەسێك بە تەنهایی یادی خودا بکات و چاوەکانی ئەسرینیان لێ ببارێت)[2] پاشان خودای گەورە دەفەرمووێت: ﴿وَيُكَفِّرُ عَنكُم مِّن سَيِّـَٔاتِكُمْ﴾ گوناهتان لەسەر لادەبات. لە جیاتی ئەو خێر کردنە، بەتایبەتی ئەگەر ئەو خێر کردنە بە نهێنی بێت. ئەو خێرکردنە بە نهێنی پلەو پایەتان بەرز

---

[1] أبوداود (٢/٨٣)، فەرموودەیەکی سەحیحە.

[2] فتح الباري (٣/٣٤٤)، مسلم (٢/٧١٥).

دەكاتەوە، دەبێتە هۆی لێخۆش بوونی گوناهتان ﴿وَٱللَّهُ بِمَا تَعۡمَلُونَ خَبِيرٌ﴾ خودا لە هەژكاریٚ دەیكەن ئاگادارەو هیچ شتێكی لیٚ ون نابیٚو بەو زوانە پاداشتتان ئەداتەوە لەسەری.

﴿لَّيۡسَ عَلَيۡكَ هُدَىٰهُمۡ وَلَٰكِنَّ ٱللَّهَ يَهۡدِي مَن يَشَآءُۗ وَمَا تُنفِقُواْ مِنۡ خَيۡرٍ فَلِأَنفُسِكُمۡۚ وَمَا تُنفِقُونَ إِلَّا ٱبۡتِغَآءَ وَجۡهِ ٱللَّهِۚ وَمَا تُنفِقُواْ مِنۡ خَيۡرٍ يُوَفَّ إِلَيۡكُمۡ وَأَنتُمۡ لَا تُظۡلَمُونَ ﴿٢٧٢﴾ لِلۡفُقَرَآءِ ٱلَّذِينَ أُحۡصِرُواْ فِي سَبِيلِ ٱللَّهِ لَا يَسۡتَطِيعُونَ ضَرۡبٗا فِي ٱلۡأَرۡضِ يَحۡسَبُهُمُ ٱلۡجَاهِلُ أَغۡنِيَآءَ مِنَ ٱلتَّعَفُّفِ تَعۡرِفُهُم بِسِيمَٰهُمۡ لَا يَسۡـَٔلُونَ ٱلنَّاسَ إِلۡحَافٗاۗ وَمَا تُنفِقُواْ مِنۡ خَيۡرٖ فَإِنَّ ٱللَّهَ بِهِۦ عَلِيمٌ ﴿٢٧٣﴾ ٱلَّذِينَ يُنفِقُونَ أَمۡوَٰلَهُم بِٱلَّيۡلِ وَٱلنَّهَارِ سِرّٗا وَعَلَانِيَةٗ فَلَهُمۡ أَجۡرُهُمۡ عِندَ رَبِّهِمۡ وَلَا خَوۡفٌ عَلَيۡهِمۡ وَلَا هُمۡ يَحۡزَنُونَ ﴿٢٧٤﴾﴾

### خێر كردن بە بتپەرست

ئەبوعەبدورەحمانی نەسائی لە ئیبنوعەبباسەوەدەگێڕێتەوە: خاوەن باوەڕان پێیان گران بوو هاوكاری كەس‌و كاریان بكەن لە بتپەرستان، پرسیاریان كرد، ڕێیان پێدرا كە هاوكاریان بكەن، جا ئەم ئایەتە هاتە خوارەوە: ﴿لَّيۡسَ عَلَيۡكَ هُدَىٰهُمۡ وَلَٰكِنَّ ٱللَّهَ يَهۡدِي مَن يَشَآءُۗ وَمَا تُنفِقُواْ مِنۡ خَيۡرٍ فَلِأَنفُسِكُمۡۚ وَمَا تُنفِقُونَ إِلَّا ٱبۡتِغَآءَ وَجۡهِ ٱللَّهِۚ وَمَا تُنفِقُواْ مِنۡ خَيۡرٍ يُوَفَّ إِلَيۡكُمۡ وَأَنتُمۡ لَا تُظۡلَمُونَ﴾[1] ئەركی سەر شانی تۆ نیە ئەمانە بخەیتە سەر ڕیٚ، بەلاّم هەركەس خودا خۆی بیەویٚ شارەزای ڕاستە ڕێی دەكا، هەرچی بە خێر دەیبەخشنەوە بۆ خۆتانەو دیارە ئێوە بۆ ڕەزامەندی خودا خێر دەكەن، هەرشتیٚ دەیكەن بە خێر پێتان دەدرێتەوە، هیچ ناهەقییتان لیٚ ناكریٚ. ئەم ئایەتە كە دەفەرموێت ﴿وَمَا تُنفِقُواْ مِنۡ خَيۡرٍ فَلِأَنفُسِكُمۡ﴾ هەرچی خێریٚ دەكەن هەر بۆ خۆتانە. وەك ئەم ئایەتە وایە ﴿مَّنۡ عَمِلَ صَٰلِحٗا فَلِنَفۡسِهِۦ﴾[2] هەركەسیٚ كاری چاك دەكات بۆخۆی دەیكات. وە خودای گەورە دەفەرمووێت:﴿وَمَا تُنفِقُونَ إِلَّا ٱبۡتِغَآءَ وَجۡهِ ٱللَّهِ﴾ دیارە ئێوە هەر بۆ ڕەزامەندی خودا خێر دەكەن. حەسەنی بەسری وتوویەتی: خێری خاوەنباوەڕ بۆ خۆیەتی، دیارە باوەڕداریش خێر ناكات لەبەر ڕەزامەندی خوا نەبیٚ.[3] عەتای خۆراسانی وتوویەتی: واتە: كاتیٚ لەبەر خودا ماڵت بەخشی، هەر

---

[1] النسائي في الكبرى (٦/٣٠٥)، سەحیحە.

[2] فصلت (٤٦).

[3] إبن أبي حاتم غ: (٣/١١١٥).

ئەوەت لەسەر کە بەو کارە خێرەت کردووە[1]. ئەمە مانایەکی زۆر چاکە، کورتەی باسەکە ئەوەیە ئەو کەسەی کە خێر دەکا، ئەگەر ئەو کارەی لەبەر ڕەزای خودا کرد، پاداشەکەی لە لای خودا بۆ نووسراوە، ئیتر بە کێی داوە، بە پیاوچاکی داوە یان بە پیاوخراپ، بە شایستەی داوە یان بە ناشایستە. ئەو کەسە لەسەر نیازەکەی پاداشت ئەدرێتەوە بەڵگەیش ئەم ئایەتەیە ﴿وَمَا تُنفِقُوا۟ مِنْ خَيْرٍ يُوَفَّ إِلَيْكُمْ وَأَنتُمْ لَا تُظْلَمُونَ﴾ هەر شتێ دەیکەن بە خێر، بە تەواوی پێتان ئەدرێتەوەو هیچ ناهەقیتان لێ ناکرێ. ئەو فەرموودەیەی لە هەردوو سەحیحەکەدا هاتووە لە ئەبوهورەیرەوە پێغەمبەری خودا(ﷺ) فەرموویەتی: (پیاوێك وتی: ئەمشەو دەبێ خێرێك بکەم، چووە دەرەوەو خێرەکەی نایە دەستی ئافرەتێکی داوێن پیسەوە، بەیانی خەڵك دەیانوت: ئەمشەو خێر بە ئافرەتێکی داوێن پیس کراوە، کابرا وتی: خودایە سوپاس بۆ تۆ (ئاخۆ بۆچی) من خێرەکەم بە داوێن پیس داوە؟ پاشان وتی: دەبێ خێرێکی تر بکەم، چووە دەرەوەو خێرەکەی نایە مستی دەوڵەمەندێکەوە بەیانی خەڵك وتیان: خێر بە دەوڵەمەندێ کراوە، کابرا وتی: خوایە سوپاس بۆ تۆ ئەمەش دەوڵەمەند بوو؟ کەواتە دەبێ خێرێکی تر بکەم، چووە دەرەوەو خێرەکەی نایە مستی دزێك، خەڵکی وتیان: خێر بە دز کراوە. کابرا وتی: خوایە سوپاس بۆ تۆ، لەسەر ئەوە کە وایلێهات خێر بە داوێنپیس‌و دەوڵەمەندو دز بکەم، ئینجا (لە خەویدا) پێی وترا خێرەکانت هەموویان جێی خۆی گرتوەو وەرگیراوە، ئافرەتە داوێن پیسەکە لەوانەیە بەو خێرە دەست لە داوێنپیسی هەڵبگرێت. دەوڵەمەندەکەیش لەوانەیە سوودی لێ وەربگرێت‌و ماندەرێك بێت بۆی تا ئەویش لەوەی کە خوا پێی بەخشیوە ببەخشێت، دزەکەیش لەوانیە بەو خێرەی تۆ واز لە دزی بهێنێت)[2].

## کێ شایستە ترە بە خێر لەگەڵ کردن

﴿لِلْفُقَرَآءِ ٱلَّذِينَ أُحْصِرُوا۟ فِى سَبِيلِ ٱللَّهِ﴾ ئەوانە خێریان پێ دەشێ کە بێدەرەتان ماونەتەوە. واتە: ئەو کۆچەریانەی کە بە تەواوی لێبڕاون لەبەر ڕەزامەندی خوداو پێغەمبەرەکەی (ﷺ) لە مەدینە نیشتەجێ بوون. هیچ هۆکارێکیان بە دەستەوە نیە کە پێویستی خۆیانی پێ دەربکەن‌و بێ نیازیان بکات. ﴿لَا يَسْتَطِيعُونَ ضَرْبًا فِى ٱلْأَرْضِ﴾ توانای چوونە دەرەوەشیان نیە کە بۆ خۆیان هەوڵێ بدەن. بۆیەك بۆ خۆیان بەدەست بێنن واتە: سەفەرکردن وەك خودای گەورە لە چەند ئایەتی ترا دەفەرموێت: ﴿وَإِذَا ضَرَبْتُمْ فِى ٱلْأَرْضِ فَلَيْسَ عَلَيْكُمْ جُنَاحٌ أَن تَقْصُرُوا۟ مِنَ

---

[1] إبن أبي حاتم غ: (٣/١١١٥).

[2] فتح الباري (٣/٣٤٠)، مسلم (٢/٧٠٩).

ﭐلصَّلَوٰةِ﴾[1] ئەگەر چوونە سەفەر هیچ گوناهتان ناگا نوێژەکانتان کورت بکەنەوە. وە دەفەرمووێت: ﴿عَلِمَ أَن سَيَكُونُ مِنكُم مَّرْضَىٰ وَءَاخَرُونَ يَضْرِبُونَ فِى ٱلْأَرْضِ يَبْتَغُونَ مِن فَضْلِ ٱللَّهِ وَءَاخَرُونَ يُقَـٰتِلُونَ فِى سَبِيلِ ٱللَّهِ﴾[2] خودا دەزانێ هەندێکتان نەخۆش دەکەون، هەندێکیشتان بۆ ڕۆزیەك خودا بیدا بە ولاتانا دەگەڕێن، کۆمەڵێکیش لە ڕێی خودا دەچنە غەزا. پاشان خودای مەزن لێرەدا دەفەرمووێت: ﴿يَحْسَبُهُمُ ٱلْجَاهِلُ أَغْنِيَآءَ مِنَ ٱلتَّعَفُّفِ﴾ ئەوانەی ئاگایان لێ نیە وا دەزانن پێویستیان بە هیچ نیە.ئەوەندە پاك وپڕشەرمن. واتە: کەسێ نەیانناسێو ئاگای لە ژیانیان نەبێ بە قسەو هەڵسوکەوتو جلو بەرگیاندا وادەزانێ کە دەوڵەمەندن. هەر لەم بارەیەوە فەرموودە لە هەردوو سەحیحەکەدا هاتووە لە ئەبوهورەیرەوە پێغەمبەری خودا (ﷺ) فەرموویەتی: (هەژار ئەو کەسە نیە کە دەگەڕێ بە خورمایە یان بە دوو خورما یان پاروویەك نان دوو پاروو یان بە خواردنێ یان بە دوو خواردن ڕازی دەبێ. بەڵکو هەژار ئەو کەسەیە کە ئەوەندەی دەست ناکەوێ بێ نیاز بێت، خەڵکیش نایناسن تا خێری پێ بکەن، خۆیشی داوای هیچ لە خەڵکی ناکات)[3] ئیمامی ئەحمەدیش ڕیوایەتی کردوە لە فەرموودەکەی ئیبنومەسعودەوە دیسان.[4] ﴿تَعْرِفُهُم بِسِيمَـٰهُمْ﴾ لە بیچمیانەوە دەیان ناسیتەوە. واتە: بە هەڵسو کەوتیاندا کەسی ژیرو خاوەن ئاوەز دەیان ناسێتەوە. وەك خودای مەزن دەفەرمووێت: ﴿سِيمَاهُمْ فِى وُجُوهِهِم﴾[5] دروشمی سوژدە بردنیان بەناو چاوانەوەیە. هەروەها دەفەرمووێت: ﴿وَلَتَعْرِفَنَّهُمْ فِى لَحْنِ ٱلْقَوْلِ﴾[6] وە بە شێوەی قسە کردنیان دەیان ناسی. پاشان خودای گەورە لێرەدا دەفەرمووێت: ﴿لَا يَسْـَٔلُونَ ٱلنَّاسَ إِلْحَافًا﴾ بە زۆر داوا لە کەس ناکەن. واتە: ئەرك ناخەنە سەر خەڵکیو زۆری لێ ناکەن بۆ شتێ کە زۆر پێویستیان پێی نیە، چونکە کەسێ داوای شتێ بکاو زۆر پێویستی پێی نەبێ، ئەوە وەك زۆر لێ سەندن وایە. ئیمامی ئەحمەد ڕیوایەتی کردوە لە ئەبوسەعیدەوە وتی: دایکم ناردمی بۆ لای پێغەمبەری خودا (ﷺ) تاداوای شتێکی لێ بکەم. چوومە خزمەتیو دانیشتم بەخێراتنی کردمو فەرمووی: (ئەوەی بێ نیازی لە خەڵك دەرخا، خوا دەوڵەمەندی

---

[1] النساء (١٠١).

[2] المزمل (٢٠).

[3] فتح الباري (٣٩٩/٣).

[4] أحمد (٣٨٤/١)، سەحیحە.

[5] الفتح (٢٩).

[6] محمد (٣٠).

دەكات. هەركەسیش پاك (نەفس بەرز) بێت خودای گەورە بە پاكی دەیهێڵێتەوە. هەركەسیش خۆگر بێ خودای بەسە. هەركەسێ داوا بكا بە ئەندازەی نرخی ئوقیەیەكیشی (أُوقية) هەبێت، ئەوە بێگومان پێداگری كردوە) وتی: وتم: وشترە یاقوتەكەم (الياقوتة) چاكترە لە ئوقیەیەك (أُوقية) گەڕامەوەو داوام لێ نەكرد.[1] ئەبوداوودو نەسائیش هەر بەم شێوەیە ڕیوایەتیان كردوە[2] پاشان خودای گەورە دەفەرموێت: ﴿وَمَا تُنفِقُوا مِنْ خَيْرٍ فَإِنَّ اللَّهَ بِهِۦ عَلِيمٌ﴾ هەر شتێ بكەن بە خێر بە تەواوی پێتان دەدرێتەوەو هیچ ناهەقیتان لێ ناكرێ و خوداش هیچی لێ ون نابێ بەزوویی پاداشتی تەواوتان زۆر بە زیادەوە ئەداتەوە لە ڕۆژی قیامەتدا كە زیاتر پێویستتان پێی دەبێ.

### ستایشی ئەو كەسانەی كە خێرخوازن

﴿ٱلَّذِينَ يُنفِقُونَ أَمْوَٰلَهُم بِٱلَّيْلِ وَٱلنَّهَارِ سِرًّا وَعَلَانِيَةً فَلَهُمْ أَجْرُهُمْ عِندَ رَبِّهِمْ وَلَا خَوْفٌ عَلَيْهِمْ وَلَا هُمْ يَحْزَنُونَ﴾ ئەوانەی بەشەوو بە ڕۆژ، بە نهێنیو بە ئاشكرا لە ڕێگەی خوادا دەبەخشن، لای خودا پاداشتیان هەیە، نە هیچ ترسێكیان لەسەرەو نە خەم دەخۆن. ئەم ستایش كردنە لە لایەن خوداوە بۆ ئەو كەسانەیە كە لە خواترسنو بە شوێن ڕەزامەندی ئەودا دەگەڕێن لە هەموو كاتێكدا شەوبێ یان ڕۆژ، بە نهێنیو بە ئاشكرا. تەنانەت خێر كردن بە كەسو كاریش دەگرێتەوە، وەك لە هەردوو سەحیحەكەدا هاتووە كە پێغەمبەری خودا (ﷺ) فەرمووی بە سەعدی كوڕی ئەبی وەقاس كاتێ كە نەخۆش بوو سەردانی كرد لە ساڵی ( ئازادكردنی ) مەككەدا، یان لە ڕیوایەتێكی تردا هاتووە لە ساڵی حەجی ماڵئاواییدا (تۆ بێگومان هیچ خێرێ ناكەی ئەگەر مەبەستت ڕەزامەندی خوا بێ لەو خێرەدا بێگومان پلەو پایەت پێی زیاتر بەرز دەبێتەوە، تەنانەت ئەو پاروەش كە دەیكەی بە دەمی هاوسەرەكەتەوە).[3] ئیمامی ئەحمەد ڕیوایەتی كردوە لە ئەبومەسعودەوە (ڕەزای خوای لێ بێ) لە پێغەمبەری خوداوە (ﷺ) كە فەرموویەتی: (بێگومان هەر موسوڵمانێ خێرێ بكا بە ماڵو منداڵی خۆیو بە هیوای پاداشتی خودا بێ، ئەوەی بە سەدەقە بۆ هەژمار كراوە).[4] بوخاریو موسلیمش ڕیوایەتیان كردوە.[5] ﴿فَلَهُمْ أَجْرُهُمْ عِندَ رَبِّهِمْ﴾ لە لای خودا پاداشتیان هەیە واتە: لە

---

[1] أحمد (٣/٩)، فەرموودەیەكی حەسەنە.

[2] أبوداود (٢/٢٧٩)، النسائي (٥/٩٨).

[3] فتح الباري (٣/١٩٦)، مسلم (٤/١٢٥٠).

[4] أحمد (٤/١٢٢)، سەحیحە.

[5] فتح الباري (١/٥٥)، مسلم (٢/٦٩٥).

ڕۆژی قیامەتدا لەسەر ئەو خێرو خواناسیە کە کردویانە﴿وَلَا خَوْفٌ عَلَيْهِمْ وَلَا هُمْ يَحْزَنُونَ ﴾ نە هیچ ترسێکیان لە سەرەو نە خەم دەخۆن.

﴿الَّذِينَ يَأْكُلُونَ الرِّبَوٰا لَا يَقُومُونَ إِلَّا كَمَا يَقُومُ الَّذِى يَتَخَبَّطُهُ الشَّيْطَـٰنُ مِنَ الْمَسِّ ذَٰلِكَ بِأَنَّهُمْ قَالُوٓا إِنَّمَا الْبَيْعُ مِثْلُ الرِّبَوٰا وَأَحَلَّ اللَّهُ الْبَيْعَ وَحَرَّمَ الرِّبَوٰا فَمَن جَآءَهُۥ مَوْعِظَةٌ مِّن رَّبِّهِۦ فَانتَهَىٰ فَلَهُۥ مَا سَلَفَ وَأَمْرُهُۥٓ إِلَى اللَّهِ وَمَنْ عَادَ فَأُولَـٰٓئِكَ أَصْحَـٰبُ النَّارِ هُمْ فِيهَا خَـٰلِدُونَ ﴿٢٧٥﴾﴾

**زەمی سوو خۆر**

کاتێ خودای مەزن باسی ئەو پیاوچاکانەی کرد کە ماڵیان بەخشیوەو زەکاتیان داوەو بە هەژارانو کەسو کارەکانیان لە هەموو کاتو ساتێکدا، پاشان دێتە سەر باسی ئەو کەسانەی کە ماڵو سامانی خەڵك بەناحەق دەخۆن ، کاتێ لە ڕۆژی قیامەتدا لە گۆڕەکانیان هێنرانە دەرەوەو زیندوو کرانەوەو ڕاوەستێنران لە مەحشەردا ﴿الَّذِينَ يَأْكُلُونَ الرِّبَوٰا لَا يَقُومُونَ إِلَّا كَمَا يَقُومُ الَّذِى يَتَخَبَّطُهُ الشَّيْطَـٰنُ مِنَ الْمَسِّ﴾ ئەو کەسانەی سوو دەخۆن، ڕاستبوونەوەیان لەو دنیا، وەك ڕاپەڕینی کەسێك کە شەیتان دەستی لێ وەشاندبێ، وەهایە. واتە: بە شێوەیەکی زۆر ناشیرین هەڵدەسنەوە. ئیبنوعەبباس: سوو خۆر لە ڕۆژی قیامەتدا زیندوو دەکرێتەوە شێت بووەو خۆی دەخنکێنێ[1] ئیبنوئەبی حاتەم ڕیوایەتی کردوە، وتی: ڕیوایەت کراوە لە عەوفی کوڕی مالیكو سەعیدی کوڕی جوبەیرو سوودیو ڕەبیعی کوڕی ئەنەسو قەتادەو موقاتیلی کوڕی حەیانەوە هەر بەم شێوەیە[2] بوخاری ڕیوایەتی کردوە لە سەمورەی کوڕی جوندوبەوە لە فەرموودە درێژەکەی خەو بینینا (المنام الطويل) کە دەفەرمووێت: (هاتینە سەر ڕووبارێك (وام دەزانی کە دەفەرمووێت) ڕووبارەکە وەك خوێنی سوور بوو، لەو کاتەدا لەناو ڕووبارەکەدا، پیاوێکی مەلەوان مەلەی دەکرد. لەو کاتەیشدا لەسەر کەناری ڕووبارەکە پیاوێکی تر بەردێکی زۆری کۆکردبوەوە لە لای خۆیدا، کاتێ کە ئەو مەلەوانە لەکاتی مەلەدا هاتوچۆی دەکرد پاشان دەهاتە لای ئەو کەسەی کە بەردەکانی لە لای خۆی کۆکردبوەوە، دەمی دەکردەوە بۆیو بەردێکی دەخستە ناو دەمی) لە تەفسیرەکەیدا باسی کردوە کە ئەو کەسە سوو خۆرە.[3] خودای مەزن دەفەرمووێت: ﴿ذَٰلِكَ بِأَنَّهُمْ قَالُوٓا إِنَّمَا الْبَيْعُ مِثْلُ الرِّبَوٰا وَأَحَلَّ اللَّهُ الْبَيْعَ وَحَرَّمَ الرِّبَوٰا﴾چونکە ئەمانە دەڵێن: مامەڵەش هەر وەك سووە، خوداش سەودای حەڵاڵ کردوەو سووی حەرام کردوە. واتە: لەبەر

---

[1] الطبري (٦/٩).

[2] إبن أبي حاتم غ: (٣/١١٣٠-١١٣١).

[3] فتح الباري (٣/٢٩٥).

ئەوە سوویان بە ڕەوا داناوە، بۆ ئەوەی دژی فەرمان و بڕیاری بوەستن، ئەمە پێوانەیەکی ڕاست نیە لە لایەن ئەوانەوە کە دەڵێن سوویش وەك مامەڵە وایە، بەڵکو بتپەرستەکان هەر دان نانێن بە ڕاستی بوونی مامەڵە لە بنەڕەتا کە خودا دایناوە لە قورئاندا. ئەگەر ئەمە بەپێوانەش بوایە (القیاس) دەبوویلێن : سوو وەك مامەڵە وایە، کەچی دەڵێن: ﴿إِنَّمَا ٱلْبَيْعُ مِثْلُ ٱلرِّبَوٰا﴾ مامەڵە وەك سوو وایە. بۆچی سووی حەرام کردوەو مامەڵەی حەلاڵ کردوە؟ ئەمە ڕەخنە گرتنە لە شەرعی خودا. واتە: سوو وەك مامەڵە وایە، ئەمەی حەرام کردوەو ئەوەی حەلاڵ کردوە. کە خودای مەزن دەفەرمووێت: ﴿وَأَحَلَّ ٱللَّهُ ٱلْبَيْعَ وَحَرَّمَ ٱلرِّبَوٰا﴾ خودا مامەڵەی حەلاڵ کردوەو سووی حەرام کردوە. هەڵدەگرێ خودای مەزن بەم دەقە وەڵامی دابنەوە لەسەر ئەو ڕەخنەیەی کە لە شەرعیان گرتووە. لەگەڵ ئەوەیشدا چاك دەزانن کە خودا لە بڕیارەکەیدا سووی لە مامەڵە جیا کردۆتەوە، بێگومان خودا زاناو لەکارزانە کە هیچ کەسێ ناتوانێ دەست بخاتە کاری، هەرچی بکات دەیکاتو پرسیاری لێ ناکرێ، بەڵکو ئەوان بەرپرسیارن. هەر خودا بە ڕاستی و بەرژەوەندی شتەکان دەزانێو ئەوەی بە سوودە بۆ بەندەکانی ڕێگەی پێداوەو ئەوەیش زیانی هەیە بۆیان، قەدەغەی کردوە. خودا زۆر بە سۆزو بەزەییترە لە دایك بۆ منداڵە شیرە خۆرەکەی. هەر بۆیە دەفەرمووێت: ﴿فَمَن جَآءَهُۥ مَوْعِظَةٌ مِّن رَّبِّهِۦ فَٱنتَهَىٰ فَلَهُۥ مَا سَلَفَ وَأَمْرُهُۥٓ إِلَى ٱللَّهِ﴾ جا هەرکەسێ ئامۆژگاری خودای بۆ هات دەس هەڵگرێ لەو شتانەی لەمەوبەر دەستی داوەتێ دەبەخشرێو خودا بە کاری ڕادەگا. واتە: هەرکەسێ بڕیاری قەدەغە کردنی سووی پێدەگاو خێرا وازی لێ دەهێنێ، ئەوەی لە پێشا کردوویەتی لە سوو خۆری، دەبەخشرێ ، بەپێی ئەم دەقە کە خودای گەورە دەفەرمووێت: ﴿عَفَا ٱللَّهُ عَمَّا سَلَفَ﴾[1] خودا لە کاری ڕابردوو چاودەپۆشێ. وەك پێغەمبەری خودا (ﷺ) لە ڕۆژی فەتحی مەککەدا فەرمووی: (هەرچی سووی زەمانی نەفامیە لەژێر ئەم هەردوو پێیەمەدایە، یەکەم سوویەکیش لای دەبەمو هەڵی دەگرم سووی عەبباسە)[2] فەرمانی پێ نەکردن بە گەڕاندنەوەی ئەو زیادانەی کە لە زەمانی نەفامیدا وەرگیرا بوو. بەڵکو چاوپۆشی لەو سووانەی پێشوو کرد وەك خودای گەورە دەفەرمووێت: ﴿فَلَهُۥ مَا سَلَفَ وَأَمْرُهُۥٓ إِلَى ٱللَّهِ﴾ لەو شتانەی لەمەوبەر دەستی داوەتێ دەبەخشرێو خودا بە کاری ڕادەگا. ئەوەی کە لە پێشا خواردوویەتی لە پێش حەرام کردنیا لێی دەبورێت. سەعیدی کوڕی جوبەیرو سوودی وتوویانە: ﴿فَلَهُۥ مَا سَلَفَ﴾ واتە:

---

[1] المائدة (٩٥).

[2] أبوداود (٣/٦٢٨)، سەحیحە.

ئەوەی لە پێش حەرام کردندا خواردوویەتی لێی بوراوە.[1] پاشان خودای گەورە دەفەرمووێت: ﴿وَمَنْ عَادَ فَأُوْلَـٰٓئِكَ أَصْحَـٰبُ ٱلنَّارِ ۖ هُمْ فِيهَا خَـٰلِدُونَ﴾ هەرکەسیش دیسان بچێتەوە سەری، دەبێتە هاوەڵی ئاگرو هەتا هەتایە هەر تیا دەبێت. واتە: دوای ئەوەی ئاگادار کرا کە خودا قەدەغەی کردوە، لێی ئەوە شایستەی تۆڵە لێ سەندنەو هیچ بروبیانویەکی نیە. ئەبوداوود ڕیوایەتی کردوە لە جابیرەوە وتوویەتی: کاتێ ئەم ئایەتە هاتە خوارەوە ﴿ٱلَّذِينَ يَأْكُلُونَ ٱلرِّبَوٰاْ لَا يَقُومُونَ إِلَّا كَمَا يَقُومُ ٱلَّذِى يَتَخَبَّطُهُ ٱلشَّيْطَـٰنُ مِنَ ٱلْمَسِّ﴾ پێغەمبەری خودا (ﷺ) فەرموویەتی: (کەسێ واز لە موخابەرە (المُخابرة) نەهێنێ. (موخابەرە: بریتیە لە ڕێژەی سێ یەکو چوار یەکو شتی تر لەو جۆرە) با جاڕی شەڕ بدات لەگەڵ خوداو پێغەمبەرەکەیدا (ﷺ))[2] حاکمیش ڕیوایەتی کردوە لە موستەدرەکەکەیدا[3] وتی: لەسەر مەرجی موسلیم سەحیحە، بەڵام بوخاریو موسلیم نەیان هێناوە. لەبەر ئەوە موخابەرە حەرام کراوە، چونکە بریتیە لە سەرپەرشتی کشتوکاڵ بە بەشێك لێی لەوەی لە زەوی دێتە دەرو سەوز دەبێ. موزابەنە: بریتیە لە فرۆشتنی خورمای تەڕ بە دارخورماکەوە بە چەند ویسقێك لە خورمای وشك. موحاقەلە (المحاقلة) بریتیە لە کڕینی دانەوێڵە بە گوڵەکەیەوە لە کێڵگەدا بە دانەوێڵەی تر لە زەویدایە بێگومان ئەم شتانەو ئەوانەیش لەمانە دەچن بۆیە حەرام کراون، لەبەر دیاری کردنو جیاکردنەوەی مادەی سوو، چونکە هاوتاییو یەکسانی ئەو دوو شتە نازانرێ لە پێش وشك بوونەوەدا، چونکە باسی سوو، باسێکی پڕ گیرو گرفتە لەلای زۆرینەی زانایان گەورەی موسوڵمان عومەری کوڕی خەتاب (ڕەزای خوای لێ بێ) وتی: سێ شت هەبوون پێم خۆش بوو کە پێغەمبەری خودا (ﷺ) وەسیەتی پێکردین پێی کۆتایمان پێ بهێنایە: باپیرو کەلالەو چەند بەشێ لە بەشەکانی سوو[4] (مەبەست پێی ئەوە بوو کە هەندێ بابەت هەبوو گومانی سووی تیا دەکرا) چونکە شەریعەت ڕوونی کردۆتەوە کە هەموو شتێکی حەرام هەر هۆکارێك بیگرێتە بەر بۆی ئەو هۆکارەیش هەر حەرامە. چونکە هەر شتێ سەر بکێشێ بۆ حەرام هەر حەرامە. وەك ئەوەی کە ( هەر شتێ واجبی پێ تەواو نابێ بەو نەبێ، خۆیشی واجبە) (واتە: ئەو شتە خۆیشی واجب دەبێ) لە هەردوو سەحیحەکەدا لە نوعمانی کوڕی بەشیرەوە، وتوویەتی : لە پێغەمبەری خوداوەم بیست(ﷺ) ئەیفەرموو: (بێگومان حەڵاڵ ئاشکرایەو حەرامیش ئاشکرایە، لە نێوانیاندا چەند شتێکی گوماناویش هەن زۆر لە خەڵکی نایان زانن، هەرکەس خۆی لە گومان بپارێزێ،

---

[1] إبن أبي حاتم غ: (٣/١١٣٥).

[2] أبوداود (٣/٦٩٥).

[3] الحاكم (٢/٢٨٥).

[4] فتح الباري (١٠/٤٨)، مسلم (٤/٢٣٢٢).

ئەوە خۆیی‌و ئاینەکەی پاراستوە لە تانەو تاوان، هەرکەسیش بکەوێتە ناو شتی گوماناویەوە، ئەوە کەتۆتە ناو شتی حەرامەوە، وەك چۆن شوانێك (ئاژەڵەکانی) لە دەورووبەری قەدەغەکراوێ دەلەوەڕێنێ، دوور نیە تێی بکەوێ).[١] وە لە سونەنەکاندا هاتووە لە حەسەنی کوڕی عەلیەوە (ڕەزای خوایان لێ بێ) وتی: لە پێغەمبەری خوداوەم بیست (ﷺ) ئەیفەرموو: (واز لە شتێ بێنە گومانت بۆ دروست دەکات بۆ شتێ کە گومانت بۆ دروست ناکات)[٢] ئیمامی ئەحمەدیش لە سەعیدی کوڕی موسەیبەوە ڕیوایەتی کردوە کە عومەر وتوویەتی: لە دواهەمین ئایەتێ کە هاتبێتە خوارەوە، ئایەتی سوو بووە، پێغەمبەری خودا (ﷺ) کۆچی دوایی کرد پێش ئەوەی تەفسیری بکا بۆمان. واز لە سوو لە شتی گوماناوی بێنن[٣] ئیبنوماجە ڕیوایەتی کردوە لە ئەبوهورەیرەوە، وتی: پێغەمبەری خودا (ﷺ) فەرموویەتی: (سوو حەفتا تاوانە، ئاسانەکەیان ئەوەیە کە پیاوێ دایکی خۆی مارە بکا)[٤] هەر لەم شێوەیە، حەرام کردنی ئەو شتانەی دەبنە هۆی بەرەو حەرام ڕۆشتن، ئەم فەرموودەیە کە ئیمامی ئەحمەد ڕیوایەتی کردوە لە عائیشەوە (ڕەزای خوای لێ بێ) وتی: کاتێ ئەم ئایەتانەی کۆتایی سورەتی بەقەرە هاتە خوارەوە لە بارەی سووەوە، پێغەمبەری خودا (ﷺ) چوو بۆ مزگەوت‌و خوێندنیەوە، بازرگانی کردنی ئارەقی حەرام کرد[٥] زانایانی فەرموودە بێجگە لە تیرمیزی[٦] ڕیوایەتیان کردوە وەك پێغەمبەری خودا (ﷺ) فەرموویەتی لە فەرموودەیەکا کە بوخاری‌و موسلیم ڕیوایەتیان کردوە: (خودا نەفرینی کرد لە جوولەکە، بەزو پیوی لێ حەرام کردن، ئەوانیش دەیانتواندەوەو دەیانفرۆشت‌و بەهاکەیان دەخوارد).[٧] فەرموودە لە عەلی‌و ئیبنومەسعودو کەسانی تریشەوەهاتووە لەسەر نەفرین کردن لەو کەسەی کە سوو حەلاڵ دەکات. وەك پێغەمبەری خودا (ﷺ) فەرموویەتی: (خودا نەفرینی کردووە لە سووخۆرو سوودەرو هەردوو شایەتەکەی‌و نووسەرەکەیشی)[٨] زانایان دەڵێن: ئەویش دەبێتە شایەت‌و ئەوەیش دەینوسێ مەگین کاتێ وا دەرکەوێ ئەو مامەڵەیە بە شێوەیەکی شەرعی کرا بێ، ئەوە لە ژێرەوە مامەڵەیەکی خراپ‌و فاسیدە، کار بە نیازە نەك بە شێوەکەی، چونکە هەموو کردارێك بە نیەتە.

---

[١] فتح الباري (١/١٥٣)، مسلم (١/١٢١٩).

[٢] تحفة الاحوذي (٧/٢٢١)، النسائي (٨/٣٢٨)، حاکم ئەڵێت: فەرموودەیەکی سەحیحە.

[٣] أحمد (١/٣٦)، إبن ماجة (٢٢٧٦)، فەرموودەیەکی باشە (جيد).

[٤] إبن ماجة (٣/٧٦٤)، الحاكم في المستدرك (٢/٣٧)، وقال على شرط الشيخين ولم يخرجاه.

[٥] أحمد (٦/٤٦)، سەحیحە.

[٦] فتح الباري (٨/٥١)، مسلم (٣/١٢٠٦)، أبوداود (٣/٧٥٩)، النسائي في الكبرى (٦/٣٠٦)، إبن ماجة (٢/١١٢٢).

[٧] فتح الباري (٦/٥٧٢)، مسلم (٣/١٢٠٧).

[٨] مسلم (٣/١٢١٩).

﴿ يَمْحَقُ اللَّهُ الرِّبَوٰا وَيُرْبِي الصَّدَقَٰتِ ۗ وَاللَّهُ لَا يُحِبُّ كُلَّ كَفَّارٍ أَثِيمٍ ﴿٢٧٦﴾ إِنَّ الَّذِينَ ءَامَنُوا وَعَمِلُوا الصَّٰلِحَٰتِ وَأَقَامُوا الصَّلَوٰةَ وَءَاتَوُا الزَّكَوٰةَ لَهُمْ أَجْرُهُمْ عِندَ رَبِّهِمْ وَلَا خَوْفٌ عَلَيْهِمْ وَلَا هُمْ يَحْزَنُونَ ﴿٢٧٧﴾ ﴾

**خودا پیت ناخاتە مامەڵەی سوو**

﴿ يَمْحَقُ اللَّهُ الرِّبَوٰا ﴾ خودا پیتی سوو هەر کەم دەکاتەوەهەرچەندە مامۆستا (هەژار) یش وای مانا کردووە، بەڵام ئایا سوو پیتی هەیە؟. واتە: خودای گەورە باسی سوو دەکات کە بەرەکەتی ماڵو سامان لەناودەبات یان هەمووی لەناو دەباتو هیچی لە دەستی خاوەنەکەیدا ناهێڵێ، یان لە پیتی ئەو سامانەی کە هەیەتی خودا بێ بەشی دەکاو بەهرەی لێ وەرناگرێ، بەڵکو بە پێچەوانەوە بەو ماڵو سامانە لە دنیادا سزای ئەداتو لە ڕۆژی قیامەتیشا تۆڵەی لێ دەسێنێ لەسەری. وەك خودای گەورە دەفەرمووێت: ﴿ قُل لَّا يَسْتَوِي الْخَبِيثُ وَالطَّيِّبُ وَلَوْ أَعْجَبَكَ كَثْرَةُ الْخَبِيثِ ﴾[1] بلێ: پیسو پاك وەك یەك نین، با زۆری پیسەکە بۆت سەرسوڕهێنەریش بێ. وە دەفەرمووێت: ﴿وَيَجْعَلَ الْخَبِيثَ بَعْضَهُ عَلَىٰ بَعْضٍ فَيَرْكُمَهُ جَمِيعًا فَيَجْعَلَهُ فِي جَهَنَّمَ ﴾[2] پیسەکان لەسەر یەك دانێو بە تێکڕایی کۆیان کاتەوەو بیانخاتە دۆزەخەوە. دەفەرمووێت: ﴿ وَمَا ءَاتَيْتُم مِّن رِّبًا لِّيَرْبُوَا فِي أَمْوَٰلِ النَّاسِ فَلَا يَرْبُوا عِندَ اللَّهِ ﴾[3] ئەوەی بە ناوی سوو ئەیدەن کە لە ناو ماڵی خەڵکدا زیاد ببێ، لەلای خودا زیاد نابێ. ئیبنوجەریر لەم دەقەدا کە خودای گەورە دەفەرمووێت: ﴿ يَمْحَقُ اللَّهُ الرِّبَوٰا ﴾ خودا پیتی سوو هەر کەم دەکاتەوە. ئەمە وێنەی ئەو خەبەرەیە کە لە عەبدوڵڵای کوڕی مەسعودەوە ڕیوایەت کراوە لە پێغەمبەرەوە (ﷺ) کە فەرموویەتی: (سوو هەرچەندە زۆریش بێ بێگومان هەر ئاکامەکەی بەرەو کەمی دەچێ)[4] ئیمامی ئەحمەدیش هەر بەم شێوەیە ڕیوایەتی کردوە لە موسنەدەکەیا[5].

---

[1] المائدة (١٠٠).

[2] الانفال (٣٧).

[3] الروم (٣٩).

[4] الطبري (١٥/٦).

[5] أحمد (٣٩٥/١)، سەنەدەکانی باشە.

## بێگومان خودا سەدەقە نەش و نما پێدەکات وەك یەکێ لە ئێوە بەچکە وشترەکەی بەخێو دەکات

﴿وَيُرْبِي ٱلصَّدَقَٰتِ﴾ وە پیتی خێرات زیاد دەکات. واتە: نەش‌ونمای پێدەکات. وتراوە: پەروەردەی دەکات. وەك بوخاری ڕیوایەتی کردوە لە ئەبوهورەیرەوە، وتی: پێغەمبەری خودا(ﷺ) فەرموویەتی: (هەرکەسێ دەنکە خورمایەك کەلە دەسکەوتی پاك پەیدای کردبێ بیکات بە خێر، خودا جگە لە پاك وەرناگرێ، بێگومان خودا بە دەستی ڕاستی لێی وەردەگرێ، پاشان نەش‌ونمای پێدەکا بۆ خاوەنەکەی، هەروەك چۆن کەسێك لە ئێوە جوانرەکەی یان بەچکە وشترەکەی پەروەردە دەکات، هەتا وای لێ دێ وەکو کێوێکی لێ دەکات)[1،2] موسلیمش ڕیوایەتی کردوە لە باسی زەکاتدا.[3]

## پێ نەزان و گوناهبار بێزراوە لە لای خودا

﴿وَٱللَّهُ لَا يُحِبُّ كُلَّ كَفَّارٍ أَثِيمٍ﴾ خودا ئەوانەی خۆش ناوێن پێ نەزان و گوناهبارن. واتە: خودا لەو کەسانە تووڕەیە کە سپڵە و پێ نەزانن و بە گفتارو کردار هەر خەریکی تاوان کردنن، خۆ دەبێ هۆکاری ببێ لە کۆتایی هاتنی ئەم ئایەتەدا ، ئەویش ئەوەیە، ئەوەی سوو خۆرە بێگومان ڕازی نابێ بەوەی کە خودا پێیداوە لە ماڵ و سامانی حەلاڵ، بەوە تێر ناخوا کە خودا ڕێی پێداوە لە دەسکەوتی پاك و بێ خەوش، بەڵکو هەوڵ ئەدات ماڵی خەڵکیش بخوات بە هۆکاری پڕوپوچ و چەندین جۆر کارو کاسپی نادروست و خراپ، دان بەو بەهرانەدانانێ کە خودا پێی بەخشیوە. زۆر ستەمکارو تاوانبارە بەوەی کە هەر خەریکی خواردنی ماڵ و سامانی خەڵکییە بە ناهەق و بێهودە.

## ستایشی سوپاس گوزاران

پاشان خودای مەزن ستایشی ئەو خاوەن باوەڕانە دەکات کە گوێڕایەڵی فەرمانی ئەون و سوپاس و ستایشی دەکەن و خێرخوازن بەرانبەر بەندەو دروسکراوەکانی و نوێژ دەکەن و زەکات ئەدەن، ئاگاداریان ئەکات کە چی بۆ داناون و چ ڕێزێکیان لێ دەگرێ، ئەوانە لە ڕۆژی قیامەتدا لە تۆڵەو سزا پارێزراون و ڕزگاریان بووە و ترسیان نیە و خەم ناخۆن. ﴿إِنَّ ٱلَّذِينَ ءَامَنُواْ وَعَمِلُواْ ٱلصَّٰلِحَٰتِ وَأَقَامُواْ ٱلصَّلَوٰةَ وَءَاتَوُاْ ٱلزَّكَوٰةَ لَهُمۡ أَجۡرُهُمۡ عِندَ رَبِّهِمۡ وَلَا خَوۡفٌ عَلَيۡهِمۡ وَلَا هُمۡ يَحۡزَنُونَ﴾ ئەو کەسانەی بڕوایان بە خودا هێناوە و کاری چاك دەکەن و لە نوێژ کردن و زەکات دان سستی ناکەن، پاداشتیان وا لەلای خودایە و نە هیچ ترسیان دێتە بەرو نە خەم دەخۆن.

---

[1] فتح الباري (٣/٣٢٦).
[2] فتح الباري (١٣/٤٢٦).
[3] مسلم (٢/٧٠٢).

﴿ يَٰٓأَيُّهَا ٱلَّذِينَ ءَامَنُواْ ٱتَّقُواْ ٱللَّهَ وَذَرُواْ مَا بَقِيَ مِنَ ٱلرِّبَوٰٓاْ إِن كُنتُم مُّؤْمِنِينَ ﴿٢٧٨﴾ فَإِن لَّمْ تَفْعَلُواْ فَأْذَنُواْ بِحَرْبٍ مِّنَ ٱللَّهِ وَرَسُولِهِۦۖ وَإِن تُبْتُمْ فَلَكُمْ رُءُوسُ أَمْوَٰلِكُمْ لَا تَظْلِمُونَ وَلَا تُظْلَمُونَ ﴿٢٧٩﴾ وَإِن كَانَ ذُو عُسْرَةٍ فَنَظِرَةٌ إِلَىٰ مَيْسَرَةٍۚ وَأَن تَصَدَّقُواْ خَيْرٌ لَّكُمْۖ إِن كُنتُمْ تَعْلَمُونَ ﴿٢٨٠﴾ وَٱتَّقُواْ يَوْمًا تُرْجَعُونَ فِيهِ إِلَى ٱللَّهِۖ ثُمَّ تُوَفَّىٰ كُلُّ نَفْسٍ مَّا كَسَبَتْ وَهُمْ لَا يُظْلَمُونَ ﴿٢٨١﴾ ﴾

**فەرماندان بە لەخواترسی و دوورکەوتنەوە لە سوو**

خودای مەزن فەرمان دەکات بە بەندە باوەڕدارەکانی کە گوێڕایەڵی فەرمانەکانی بکەن‌و ڕێگریان لێ دەکات لەو شتانەی کە لە توڕەیی خۆی نزیکیان دەکاتەوەو لە ڕەزامەندی دووریان دەخاتەوە﴿ يَٰٓأَيُّهَا ٱلَّذِينَ ءَامَنُواْ ٱتَّقُواْ ٱللَّهَ﴾ ئەی ئەو کەسانەی کە باوەڕدارن، ئەبێ لە خوا بترسن. واتە: خودا بکەنە چاودێر لەو کارانەی کە دەیکەن بەسەر خۆتانەوە. ﴿وَذَرُواْ مَا بَقِيَ مِنَ ٱلرِّبَوٰٓاْ﴾ دەست هەڵگرن لەو سووەی کە لای خەڵك ماوتانە. واتە: واز بێنن لەو ماڵە زیادەیەی لەلای خەڵکی ماوتانە، دوای ئەم ئاگادارکردنەوەیە. ﴿إِن كُنتُم مُّؤْمِنِينَ﴾ ئەگەر ئێوە باوەڕدارن بەوە کە خودا بڕیاری داوە بۆتان لە حەڵاڵ کردنی مامەڵەو قەدەغەکردنی سووخۆریو ئەو شتانەی کە نزیکن لە سووخۆریەوە. زەیدی کوڕی ئەسلەم‌و ئیبنوجورەیج‌و موقاتیلی کوڕی حەیان‌و سوودی دەڵێن: ئەم ئایەتانە لەبارەی بەنی عەمری کوڕی عومەیر لە سەقیف‌و بەنی موغەیرە لە بەنی مەخزوم هاتنەخوارەوە، کە لە چەرخی نەفامیدا سوو لە نێوانیاندا هەبوو. کاتێ کە ئیسلام هات‌و مووسوڵمان بوون. سەقیفیەکان داوای ئەو سووەیان لێ دەکردن. ئەمانیش لەناو خۆیاندا ڕاوێژیان کرد، بەنی موغەیرە وتیان: ئێمە کە موسوڵمانین سوو نادەین، لەو بارەیەوە عەتتابی کوڕی ئەسید کە بریکاری مەککە بوو نامەیەکی نووسی بۆ پێغەمبەری خودا (ﷺ)ئیتر ئەم ئایەتە هاتە خوارەوە، پێغەمبەری خودا (ﷺ) ئەم ئایەتەی بە نامەیەکا بۆ نارد ﴿فَإِن لَّمْ تَفْعَلُواْ فَأْذَنُواْ بِحَرْبٍ مِّنَ ٱللَّهِ وَرَسُولِهِۦ﴾ ئەی ئەو کەسانەی کە بڕوادارن دەست هەڵگرن لەو ماڵە زیادەی لەلای خەڵکی ماوتانە ئەگەر خاوەن باوەڕن. ئەگەر دەستی لێ هەڵنەگرن، سا بزانن ئێوە لەگەڵ خوداو پێغەمبەرەکەیدا شەڕ دەکەن. وتیان: دەگەڕێینەوە بۆ لای خوداو دەست هەڵدەگرین لەو زیادە سووە کە ماوە. وازیان لە هەمووی هێنا[1] ئەمە هەڕەشەیەکی زۆر توندو تیژە لەو کەسانەی کە بەردەوام دەبن لەسەر سووخۆری دوای ئەم ئاگادارکردنەوەیە.

---

[1] إبن أبي حاتم غ: (٣/١١٤٠-١١٤١).

**سووخۆر شەڕ رادەگەیەنێ لەگەڵ خوداو پێغەمبەرەکەیدا**

ئیبنوجورەیج لەئیبنوعەبباس وەدەگێڕێتەوە: ﴿فَأْذَنُوا۟ بِحَرْبٍ﴾ واتە: خۆیان ئامادە بکەن بۆ شەڕ کردن لەگەڵ خوداو پێغەمبەرەکەیدا (ﷺ)[1] هەر لە ئیبنوعەبباسەوە وتی: لە ڕۆژی قیامەتدا دەڵێن بە سوو خۆرەکان چەکەکەت هەلگرە بۆ شەڕ کردن، پاشان ئەم ئایەتەی خوێند ﴿فَإِن لَّمْ تَفْعَلُوا۟ فَأْذَنُوا۟ بِحَرْبٍ مِّنَ ٱللَّهِ وَرَسُولِهِۦ﴾ ئەگەر دەستی لێ هەڵنەگرن. سا بزانن ئێوە لەگەڵ خوداو پێغەمبەرەکەیدا شەڕ دەکەن. دیسان عەلی کوڕی ئەبوتەلحە ڕیوایەتی کردوە لە ئیبنوعەبباسەوە.[2] هەرکەسێ بەردەوام بێ لەسەر سووخۆریو وازی لێ نەهێنێ، ئەوە پێویستەگەورەی موسوڵمانانە داوای تەوبە کردنی لێبکات، ئەگەر وازی هێنا باشە، ئەگەر وازیشی نەهێنا لە ملی بدرێت[3] پاشان خودای گەورە دەفەرموێت: ﴿وَإِن تُبْتُمْ فَلَكُمْ رُءُوسُ أَمْوَٰلِكُمْ لَا تَظْلِمُونَ وَلَا تُظْلَمُونَ﴾ ئەگەر دەستی لێ هەلگرن، دەسمایەی خۆتان بسێننەوە، ئیتر ئەوسا نە ئێوە ناهەقی دەکەن نە ناهەقیتان لێ دەکرێ، بە وەرگرتنەوەی دەسمایەکەتان. ئەوەی هەقی خۆتانە بێ کەم و کوڕی دەیبەنەوەو زیادەیش هەڵناگرن. ئیبنوئەبی حاتەم لە عەمری کوڕی ئەحوسەوە ڕیوایەتی کردوە: لە حەجی ماڵئاوایدا پێغەمبەری خودا وتارێکی دلو فەرمووی: (ئەوسا بزانن هەموو سوویەك (لەسەرتان بووە) هەمووی هەڵگیراوە لەسەرتان، دەستمایەی خۆتان هی خۆتانە، نە ئێوە ناهەقی دەکەنو نە ناهەقیتان لێدەکرێ، یەکەم سوویەکیش هەڵدەگیرێ سووەکەی عەبباسی کوڕی عەبدولموتەلیبە کەهەمووی هەڵگیراوە)[4].

**چاکەکردن لەگەڵ قەرزاری نەدارا**

خودای مەزن دەفەرموێت: ﴿وَإِن كَانَ ذُو عُسْرَةٍ فَنَظِرَةٌ إِلَىٰ مَيْسَرَةٍ ۚ وَأَن تَصَدَّقُوا۟ خَيْرٌ لَّكُمْ ۖ إِن كُنتُمْ تَعْلَمُونَ﴾ ئەگەر قەرزاریش نەدار بوو، ماوەی بدەن هەتا دەبیێ، ئەگەر بزانن پێ بەخشینی بۆ ئەوان چاکترە. خودای گەورە فەرمان دەکات بە خۆگرتن دەربارەی قەرزارو نەدارەکان کە توانای دانەوەی ئەو قەرزەیان نیە، دەفەرموێت: ﴿وَإِن كَانَ ذُو عُسْرَةٍ فَنَظِرَةٌ إِلَىٰ مَيْسَرَةٍ﴾ ئەگەر قەرزار نەدار بوو، ماوەی بدەن هەتا دەبیێ. نەك وەك ئەوانەی چەرخی نەفامی کاتێ کە قەرزارەکە ماوەی تەواو دەبوو پێی دەوت: دەبێ قەرزەکە بدەیتەوە یان سووی بخەیتە سەر، پاشان بڕیاری لابردنی ئەو

---

[1] الطبري (٦/٢٦).

[2] الطبري (٦/٢٥).

[3] الطبري (٦/٢٥)

[4] إبن أبي حاتم غ: (١١٤٧/٣).

سووە درا، بە خێرێکی باش دانرا بۆ ئەو کەسانەی واز لەو سووە دێنن. خودای گەورە دەفەرمووێت: ﴿وَأَن تَصَدَّقُوا۟ خَيْرٌ لَّكُمْ إِن كُنتُمْ تَعْلَمُونَ﴾ ئەگەر بشزانن بەخشین بۆ ئەوان چاکترە. واتە: ئەگەر واز لە دەسمایەکەی خۆیان بێنن و قەرزارەکە بە تەواوی لەو قەرزە ببەخشن چاکترە. ئیمامی ئەحمەد ڕیوایەتی کردوە لە سولەیمانی کوڕی بورەیدەوە لە باوکیەوە، وتی: بیستم لە پێغەمبەری خوداوە (ﷺ) ئەیفەرموو: (هەرکەسێ قەرزارێ ماوە بدات، ئەوا بۆ هەر ڕۆژێ بە ئەندازەی ئەو قەرزە خێری دەگات). وتی: پاشان گوێم لێی بوو ئەیفەرموو: (هەرکەسێ قەرزارێ ماوە بدات ئەوە بۆ هەر ڕۆژێ بە دوو ئەوەندەی ئەو قەرزە خێری دەگات). وتم: ئەی پێغەمبەری خودا گوێم لێت بوو ئەتفەرموو: (هەرکەسێ قەرزارێ ماوە بدات، ئەوە بۆ هەر ڕۆژێ بە ئەندازەی ئەو قەرزە خێری دەگا). پاشان هەر گوێم لێت بوو ئەتفەرموو: (هەرکەسێ قەرزارێ ماوە بدات، ئەوە بۆ هەر ڕۆژێ دوو ئەوەندەی ئەو قەرزە خێری دەگا) فەرمووی: (ئەو کەسە بۆ هەموو ڕۆژێ بە ئەندازەی ئەو قەرزە خێری دەگا لە پێش ئەوە کە قەرزەکە بداتەوە، ئەگەر قەرزەکەی دایەوەو هەر ماوەی دا، ئەوە بۆ هەر ڕۆژێ دوو ئەوەندەی قەرزەکە خێری دەگا)[1] ئیمامی ئەحمەد ڕیوایەتی کردوە لە موحەممەدی کوڕی کەعبی قەرەزیەوە کە ئەبوقەتادە قەرزی بە لای پیاوێکەوە بووە. دەهات بۆ لای قەرزەکەی لێ وەرگرێتەوە خۆی لێ دەشاردەوە، ڕۆژێك هاتو منداڵێ هاتە دەرەوە (لە ماڵی) پرسیاری ئەو پیاوەی لێ کرد، وتی: بەڵێ لە ماڵەوەیە، خەزیرەی دەخوارد (جۆرە خواردنێك بووە) بانگی کرد وتی: فڵانە کەس، وەرە دەرەوە، هەواڵم پێدراوە کە لە ماڵەوەی، هاتە دەرەوە بۆ لای. وتی: چی تۆی لە من شاردۆتەوە؟ پیاوەکە وتی: من نەدارم، هیچ شتێکم نیە، وتی: توخودا تۆ نەداری؟ وتی: بەڵێ، ئەبوقەتادە گریاو پاشان وتی: بیستومە لە پێغەمبەری خودا (ﷺ) ئەیفەرموو: (هەرکەسێ ماوە بدات بەو کەسەی قەرزاریەتی یان لەسەری بسڕێتەوە (لێی خۆش بێ) ئەوە لە ژێر سێبەری عەرشدایە لە ڕۆژی قیامەتدا)[2] موسلیمش لە سەحیحەکەیدا ڕیوایەتی کردوە[3] حافیز ئەبویەعلای موسڵی ڕیوایەتی کردوە لە حوزەیفەوە: پێغەمبەری خودا (ﷺ) فەرموویەتی: (بەندەیەك لە بەندەکانی خودا دەهێنرێ بۆ لای، دەفەرمووێت: چیت کردوە بۆ من لە دنیادا؟ بەندەکە دەڵێ: ئەی پەروەردگارم بە ئەندازەی گەردیلەیەك (مێرولەیەکی بچووك) کردەوەم نەکردوە بۆ تۆ کە بیکەمە تکا لەلات (سێ جار ئەمەی وتەوە) لە دوایین جارا بەندەکە وتی: ئەی پەروەردگارم تۆ ماڵی زۆرت پێ دەبەخشیم، منیش پیاوێك

---

[1] أحمد (٥/٣٦٠)، فەرموودەیەکی سەحیحە.

[2] أحمد (٥/٣٠٨)، سەحیحە.

[3] مسلم (٤/٢٠٧٤).

بووم مامەڵەم لەگەڵ خەڵکا دەکرد، مۆڵەت دانیان لە ڕەوشتی من بوو. ئاسانکاریم لەگەڵ ئەوانەدا دەکرد کە ئاسانکاریان دەکردو چاوپۆشیم لە نەداریش ئەکرد، وتی: خودای مەزن دەفەرمووێت: من شایستە ترم لەو کەسە کە ئاسانکاری دەکات، بڕۆرە بەهەشت). بوخاریو موسلیمو ئیبنوماجە ڕیوایەتیان کردوە. موسلیم ئەمەی بۆ زیاد کردوە: عوقبەی کوڕی عامیرو ئەبوسەعیدی بەدریش ڕیوایەتیان کردوە بەم شێوەیە لە پێغەمبەری خوداوە (ﷺ).[1] پاشان خودای مەزن ئامۆژگاری بەندەکانی دەکاو باسی نەمانی دنیاو ئەوەی کە تیایەتی لە ماڵو سامانو هەر شتێکی تردەکات کە هەمووی لەناو دەچێ، هەروەها لێپرسینەوەی خودا لە بەندەکانی دەربارەی ئەو شتانەی کە کردویانەو پاداشت دانەوەیان لەسەر کردارەکانیان چاکە بە چاکەو خراپەیش بە تۆڵە لێسەندنو سزادانو ترساندنیان لە جەزرەبەی خۆی. ﴿وَاتَّقُوا يَوْمًا تُرْجَعُونَ فِيهِ إِلَى اللَّهِ ثُمَّ تُوَفَّى كُلُّ نَفْسٍ مَا كَسَبَتْ وَهُمْ لَا يُظْلَمُونَ﴾ ترسیشتان لەو ڕۆژە هەبێ کە دەتان هێننەوە لای خودا، ئەو ڕۆژەی هەرکەس هەرچی کردوە (بە تەواوی) دێتەوە ڕێیو ناهەقی لە کەس ناکرێ. ڕیوایەت کراوە ئەم ئایەتە دواین ئایەت بووە لە قورئانی پیرۆزا هاتۆتە خوارەوە. نەسائی ڕیوایەتی کردوە لە عەبدوڵلای کوڕی عەبباسەوە، وتی: دواین ئایەت هاتۆتە خوارەوە لە قورئاندا ئەم ئایەتە بووە[2]. زەححاکو عەوفیش هەر بەم شێوەیە ڕیوایەتیان کردوە لە ئیبنوعەبباسەوە[3].

﴿يَا أَيُّهَا الَّذِينَ آمَنُوا إِذَا تَدَايَنْتُمْ بِدَيْنٍ إِلَى أَجَلٍ مُسَمًّى فَاكْتُبُوهُ وَلْيَكْتُبْ بَيْنَكُمْ كَاتِبٌ بِالْعَدْلِ وَلَا يَأْبَ كَاتِبٌ أَنْ يَكْتُبَ كَمَا عَلَّمَهُ اللَّهُ فَلْيَكْتُبْ وَلْيُمْلِلِ الَّذِي عَلَيْهِ الْحَقُّ وَلْيَتَّقِ اللَّهَ رَبَّهُ وَلَا يَبْخَسْ مِنْهُ شَيْئًا فَإِنْ كَانَ الَّذِي عَلَيْهِ الْحَقُّ سَفِيهًا أَوْ ضَعِيفًا أَوْ لَا يَسْتَطِيعُ أَنْ يُمِلَّ هُوَ فَلْيُمْلِلْ وَلِيُّهُ بِالْعَدْلِ وَاسْتَشْهِدُوا شَهِيدَيْنِ مِنْ رِجَالِكُمْ فَإِنْ لَمْ يَكُونَا رَجُلَيْنِ فَرَجُلٌ وَامْرَأَتَانِ مِمَّنْ تَرْضَوْنَ مِنَ الشُّهَدَاءِ أَنْ تَضِلَّ إِحْدَاهُمَا فَتُذَكِّرَ إِحْدَاهُمَا الْأُخْرَى وَلَا يَأْبَ الشُّهَدَاءُ إِذَا مَا دُعُوا وَلَا تَسْأَمُوا أَنْ تَكْتُبُوهُ صَغِيرًا أَوْ كَبِيرًا إِلَى أَجَلِهِ ذَلِكُمْ أَقْسَطُ عِنْدَ اللَّهِ وَأَقْوَمُ لِلشَّهَادَةِ وَأَدْنَى أَلَّا تَرْتَابُوا إِلَّا أَنْ تَكُونَ تِجَارَةً حَاضِرَةً تُدِيرُونَهَا بَيْنَكُمْ فَلَيْسَ عَلَيْكُمْ جُنَاحٌ أَلَّا تَكْتُبُوهَا وَأَشْهِدُوا إِذَا تَبَايَعْتُمْ وَلَا يُضَارَّ كَاتِبٌ

---

[1] فتح الباري (٦/٥٧٠)، مسلم (٣/١١٩٥)، إبن ماجة (٢/٨٠٨).

[2] النسائي في الكبرى (٦/٣٠٧).

[3] الطبري (٦/٤٠).

وَلَا شَهِيدٌۚ وَإِن تَفۡعَلُواْ فَإِنَّهُۥ فُسُوقُۢ بِكُمۡۗ وَٱتَّقُواْ ٱللَّهَۖ وَيُعَلِّمُكُمُ ٱللَّهُۗ وَٱللَّهُ بِكُلِّ شَيۡءٍ عَلِيمٞ (٢٨٢)﴾

**فەرماندان بە نووسینی قەرزو مامەڵە کە بۆ ماوەیەکی دیاری کراوو**

ئەم ئایەتە پیرۆزە درێژترین ئایەتە لە قورئاندا، ئیمامی ئەحمەد ڕیوایەتی کردوە لە ئیبنوجەریرەوە لە سەعیدی کوڕی موسەییبەوە کە پێی گەیشتوە نوێترینی ئەم قورئانە بە عەرشەوە ئایەتی قەرزە[1]. ﴿يَٰٓأَيُّهَا ٱلَّذِينَ ءَامَنُوٓاْ إِذَا تَدَايَنتُم بِدَيۡنٍ إِلَىٰٓ أَجَلٖ مُّسَمّٗى فَٱكۡتُبُوهُۚ﴾ ئەی ئەو کەسانەی خاوەن باوەڕن، هەرکاتێ بۆ ماوەیێکی دیاریکراو، قەرز لە یەکتری دەکەن، بینوسن. ئەمە ڕێنمایەکە لەلایەن خوداوە بۆ بەندە خاوەنباوەڕەکانی ، ئەگەر مامەڵەیەکی قەرزیان کرد لە نێوان یەکترا با بینووسن، چونکە ئەو نووسینە دەبێتە هۆی باش پارێزگاری لێکردن‌و دیاری کردنی کاتەکەی‌و چاکترین شایەتیشە لەسەری. خودای گەورە لە کۆتایی ئایەتەکەدا ئاگاداری داوە لەم بارەیەوەو فەرموویەتی: ﴿ذَٰلِكُمۡ أَقۡسَطُ عِندَ ٱللَّهِ وَأَقۡوَمُ لِلشَّهَٰدَةِ وَأَدۡنَىٰٓ أَلَّا تَرۡتَابُوٓاْ﴾ لەلای خودا ڕواترەو بۆ شایەتی لەسەردان لەبار ترەو لە دوودڵی نەهێشتن نزیکترە. لە هەردوو سەحیحەکەشدا لە ئیبنوعەبباسەوە هاتووە: پێغەمبەر (ﷺ) کە هاتە مەدینە ئەوان سەلەمیان لە بەروبوما ئەکرد دوو ساڵ‌و سێ ساڵ، پێغەمبەری خودا (ﷺ) فەرمووی: (هەرکەسێك سەلەمی کرد با سەلەم لە کێشانەو پێوانەیەکی دیاری کراودا بکات بۆ کاتێکی دیار کراو).[2] هەروەها خودای گەورە﴿فَٱكۡتُبُوهُۚ﴾ فەرمانی داوە بە نووسینی قەرز بۆ متمانە بوون‌و پاراستنی. ئیبنوجورەیج وتی: کەسێ مامەڵەی قەرزی کرد بینوسێ، هەرکەسێ مامەڵەی کرد با شایەتی هەبێ.[3] ئەبوسەعیدو شەعبی‌و ڕەبیعی کوڕی ئەنەس‌و حەسەن‌و ئیبنوجورەیج‌و ئیبنوزەیدو کەسانی تریش وتویانە.[4] ئەو شایەتیە (واجب) بووە. پاشان بەم ئایەتە: ﴿فَإِنۡ أَمِنَ بَعۡضُكُم بَعۡضٗا فَلۡيُؤَدِّ ٱلَّذِي ٱؤۡتُمِنَ أَمَٰنَتَهُۥ﴾[5] نەسخ بووەتەوە جا ئەگەر هەندێکتان لە هەندێکتان دڵنیا بوون با ئەو کەسەی کە بە ئەمین دانراوە سپاردەکە بداتەوە. خودای مەزن دەفەرموێت: ﴿وَلۡيَكۡتُب بَّيۡنَكُمۡ كَاتِبُۢ بِٱلۡعَدۡلِۚ﴾ با نووسەرێ خواپەسەند بۆتان بنوسێ. واتە: با

---

[1] الطبري (٦/٤١).

[2] فتح الباري (٤/١٠٥)، مسلم (٣/١٢٢٦).

[3] الطبري (٦/٤٧).

[4] الطبري (٦/٤٧/٤٩/٥٠).

[5] البقرة (٢٨٣).

نوسەرێ بە ڕاستیو دادپەروەرانە لە نێوانتاندا بۆتان بنووسێ، لە نوسینەکەیدا پشتگیری لە هیچ کەسێ نەکا، هیچ شتێ نەنوسێ بەپێی ڕێکەوتنی هەردوو لا نەبێ، بەبێ زیادو کەم ﴿وَلَا يَأْبَ كَاتِبٌ أَن يَكْتُبَ كَمَا عَلَّمَهُ ٱللَّهُ﴾ نابێ نووسەر لەم کارە خۆی لا بدات، با بنووسێ وەك خودا فەرمانی پێداوە واتە: ئەو کەسەی دەزانێ بنووسێ دەبێ خۆی لانەدا کە بۆ خەڵکی بنووسێ، بەلام ئەوەی لەسەری پێویست نیە ئەگەر نەزانێ وەك ئەو کەسەی کە دەزانێ بنووسێ. با کەسێ دەزانێ بە خێری خۆی بنووسێ بۆ ئەو کەسەی نازانێ بنووسێ. وەك لەم فەرموودەیەدا هاتووە: (لە خێرو چاکەکردنا هاوکاری پیشەوەرێ بکەی یان بە پیشەیەك هاوکاری بکەی کە نایزانێ)[1] لە فەرموودەیەکی ترا هاتووە: (هەرکەسێ زانیاریەك بشارێتەوە کە دەیزانێ لە ڕۆژی قیامەتدا لەغاو دەکرێ بە لەغاوێکی ئاگرین)[2] موجاهیدو عەتا وتیان: پێویستە لەسەر نووسەر کە بنووسێ. خودای گەورە دەفەرموێت: ﴿فَلْيَكْتُبْ وَلْيُمْلِلِ ٱلَّذِى عَلَيْهِ ٱلْحَقُّ وَلْيَتَّقِ ٱللَّهَ رَبَّهُۥ﴾ هەرچی قەرزار بۆی دەڵێ، ئەو بینووسێو دەبێ ترسی خودای هەبێ ﴿وَلَا يَبْخَسْ مِنْهُ شَيْـًٔا فَإِن كَانَ ٱلَّذِى عَلَيْهِ ٱلْحَقُّ سَفِيهًا أَوْ ضَعِيفًا﴾ ئەم لاو ئەولای تێدا نەکا. ئەگەر ئەو کەسەی قەرزارە کەم ئاوەزە یان بێ هێزەو لاوازە. (وەك منداڵوکەمناوەن). ﴿أَوْ لَا يَسْتَطِيعُ أَن يُمِلَّ﴾ یان ناتوانێ ئەوەی پێویستە بنووسرێ دەری ببڕێ بەهۆی کەم ئاوەزیو نەفامیەوە چاکەو خراپەی لێك جیانەدەکردەوە ﴿فَلْيُمْلِلْ وَلِيُّهُۥ بِٱلْعَدْلِ﴾ با سەرپەرشتیاری ئەو لەباتی ئەو بۆی بڵێت بە ڕێكو ڕاستی.

### فەرماندان بە شایەت گرتن لەگەڵ نووسیندا

﴿وَٱسْتَشْهِدُوا۟ شَهِيدَيْنِ مِن رِّجَالِكُمْ فَإِن لَّمْ يَكُونَا رَجُلَيْنِ فَرَجُلٌ وَٱمْرَأَتَانِ﴾ دوو پیاو لە خۆتان شایەت بن، ئەگەر دوو پیاو پەیدا نەبوون، با پیاوێكو دوو ژن بێت. خودای مەزن فەرمانی داوە بە شایەت گرتن لەگەڵ نووسیندا بۆ زیاتر متمانە کردن، ئەمەیش مەبەست پێی ئەو شتانەیە کە ماڵو سامان دەگرێتەوە. بۆیە دوو ژن لە جێی پیاوێ دانراوە لەبەر ناتەوای عەقڵی ژنە، وەك موسلیم لە سەحیحەکەیدا ڕیوایەتی کردوە لە ئەبووهورەیرەوە لە پێغەمبەری خوداوە (ﷺ) کە فەرموویەتی: (ئەی دەستەی ئافرەتان خێر بکەنو زۆر داوای لێبوردن بکەن، بەڕاستی من ئێوەم دیوە زۆرینەی خەڵکی ناو ئاگرن) ژنێکی قسەزانیان وتی: ئێمە چیمانە وا زۆرینەی خەڵکی ئاگرین ئەی پێغەمبەری خودا (ﷺ)؟ فەرمووی: (زۆر نەفرین کەرنو حاشا لە (چاکەی) هاوسەر دەکەن (لەوانەی عەقڵو

---

[1] فتح الباري (٥/١٧٦).

[2] الطبري (٥/١١).

دینیان ناتەواوە ئەم دیوە لە ئێوە زاڵ تر بێ بەسەر عەقڵا) وتی: ئەی پێغەمبەری خودا (ﷺ) ناتەواوی عەقڵو دین کامەیە؟ فەرمووی: (ناتەواوی عەقڵ، شایەتی دوو ژن بەرانبەری شایەتی پیاوێکە، ئەمە ناتەاوی عەقڵە، چەندین شەو دەمێنێتەوە نوێژ ناکاو لە ڕەمەزانیشا ڕۆژو دەشکێنێ، ئەمەیش ناتەواوی دینە)[1] پاشان خودای گەورە دەفەرمووێت: ﴿مِمَّن تَرْضَوْنَ مِنَ ٱلشُّهَدَآءِ﴾ کە ئێوە لێیان ڕازی بن. لەم دەقەوە دیارە کە مەرجە شایەت دادپەروەر بێت ﴿أَن تَضِلَّ إِحْدَىٰهُمَا فَتُذَكِّرَ إِحْدَىٰهُمَا ٱلْأُخْرَىٰ﴾ لە کار ئاگادار بکرێن، تا ئەگەر یەکێ لەم دوانە لەبیری چوو، ئەوی تر بیری بخاتەوە. واتە: هەریەکێ لەو دوو ژنە شایەتیەکەی لەبیرچوو، ئەوی تر ئاگاداری بکاتەوە لەو شایەتیە کە داویەتی. ﴿وَلَا يَأْبَ ٱلشُّهَدَآءُ إِذَا مَا دُعُوا۟﴾ هەرکاتێ بۆ شایەتیدان بانگ کران، ڕەوا نیە خۆتان لادەن، قەتادەو ڕەبیعی کوڕی ئەنەس وتویانە: هەرکەسێ بانگ کرا بۆ شایەتیدان دەبێ قبوڵی بکات. ئەمە وەك ئەو دەقە وایە کە خودای گەورە دەفەرمووێت: ﴿وَلَا يَأْبَ كَاتِبٌ أَن يَكْتُبَ كَمَا عَلَّمَهُ ٱللَّهُ﴾[2] نابێ نووسەر خۆی لابدا، با بنووسێ وەك خودا فەرمانی پێداوە، ئا لێرەدا دەردەکەوێ کە شایەتیدان فەرزی کیفایەیە (ئەمە ڕاوبۆچوونی کۆی زانایانە) لەم دەقەدا کە دەفەرمووێت: ﴿وَلَا يَأْبَ ٱلشُّهَدَآءُ إِذَا مَا دُعُوا۟﴾[3] لە شایەتی دان لەبەر ئەوە کە دەفەرمووێت: ﴿ٱلشُّهَدَآءُ﴾ شایەتیش لە ڕاستیدا ئەو کەسەیە کە شایەتیەکە لە ئەستۆ دەگرێ، کاتێ کە بانگ کرا بۆ شایەتیدان پێویستە لەسەری ڕازی بێت ئەگەر داوای لێ کرا. خۆ ئەگەر داوای لێ نەکرا ئەوە فەرزی کیفایەیە والله أعلم. موجاهیدو ئەبومیجلەزو کەسانی تریش وتویانە: ئەگەر بانگ کرای بۆ شایەتیدان تۆ خۆت سەرپشکی، کاتێ لەوێدا بووی ڕازیی ببە.[4] لە ئیبنوعەبباس‌و حەسەنی بەسریەوە ڕیوایەت کراوە هەردوو حاڵەتەکە دەگرێتەوە: گرتنە ئەستۆو قبووڵ کردنیش. ﴿تَسْـَٔمُوٓا۟ أَن تَكْتُبُوهُ صَغِيرًا أَوْ كَبِيرًا إِلَىٰٓ أَجَلِهِۦ﴾ لە نووسینی ماوەی قەرز (کەم بێ یان زۆر) نابێ سستی بکەن‌و هەردەبێ بینووسن‌و ماوەکەیشی دیاری بکەن. واتە: ماندوو مەبن لە نووسینی حەقدا هەر چۆنێك بوو، کەم بێ یان زۆر ماوەکەیشی دیاری بکەن. ﴿ذَٰلِكُمْ أَقْسَطُ عِندَ ٱللَّهِ وَأَقْوَمُ لِلشَّهَـٰدَةِ وَأَدْنَىٰٓ أَلَّا تَرْتَابُوٓا۟﴾ لە لای خودا ڕەواترەو بۆ شایەتی لەسەردانیش لەبارترەو لە دوو دڵی نەهێشتنیش

---

[1] مسلم (٨٧/١).

[2] البقرة (٢٨٢).

[3] الطبري (٦٨/٦).

[4] إبن أبي حاتم غ: (١١٨١/٣)، الطبري (٧١/٦).

نزیکترە. واتە: ئەمەی کە فەرمانمان پێکردن لە نووسینی هەق ئەگەر قەرز بوو بۆ ماوەیەك ، لە لای خودا ڕاستو ڕەواترە بۆ شایەتیدان. واتە: کاتیٚ کە نووسی، کە چاوی پێی کەوت شایەتیەکەی دێتەوە بیر، چونکە لەوانەیە ئەگەر نەینوسیٚ لە بیری بچێتەوە، وەك زۆر جار ڕووی داوە ﴿وَأَدْنَىٰٓ أَلَّا تَرْتَابُوٓاْ﴾ لە دوودلّی نەهێشتنەوە نزیکترە، بەلّکو لەکاتی ئەو ناکۆکیەدا دەگەڕێنەوە بۆ نووسینە کەو ئەو ناکۆکیە لە نێوانتان نامێلّیٚ ﴿إِلَّآ أَن تَكُونَ تِجَٰرَةً حَاضِرَةً تُدِيرُونَهَا بَيْنَكُمْ فَلَيْسَ عَلَيْكُمْ جُنَاحٌ أَلَّا تَكْتُبُوهَا﴾ مەگین وەختیٚ بازرگانیتان دەست بە دەستو نەقد بیٚ. ئەوسا ئەگەر نەشنووسن هیچ ڕێگریەك نیە. بەلاّم کە کڕینو فرۆشتان کرد شایەت بگرن. ئەم بڕیارە (نەسخ) بووەتەوە بەم دەقە کە خودای گەورە دەفەرمووێت: ﴿فَإِنْ أَمِنَ بَعْضُكُم بَعْضًا فَلْيُؤَدِّ ٱلَّذِى ٱؤْتُمِنَ أَمَٰنَتَهُۥ﴾[1] جا مەگین ترستان لە یەکتری نەبیٚ، کە ئەوسا بارمتەی ناویٚ، با قەرزار قەرزەکەی خۆی بداتەوە. یان مەبەست پێی ڕێنماییو سونەتەو شایەتی (واجب) نیە. بەلگەیش لەسەر ئەمە فەرموودەکەی خوزەیمەی کوڕی سابتی ئەنساریە، کە ئیمامی ئەحمەد ڕیوایەتی کردوە لە عەمارەی کوڕی خوزەیمەی ئەنساریەوە کە مامەی بۆی گێڕاوەتەوە کە یەکێك بووە لە هاوەڵەکانی پێغەمبەری خودا (ﷺ) کە پێغەمبەر (ﷺ) ئەسپێکی لە عەرەبێکی دەشتەکی کڕی، شوێنی کەوتبوو هەتا نرخی ئەسپەکەی بداتیٚ، پێغەمبەر پەلەی بوو، بەلاّم عەرەبە دەشتەکیەکە دوای دەخست، چەند پیاویٚ هاتنە ڕێی عەرەبە دەشتەکیەکەو مامەڵەی ئەسپەکەیان لەگەلا کرد، ئاگایان لیٚ نەبوو پێغەمبەر (ﷺ) کڕیویەتی، هەتا هەندێکیان نرخی زیاتریان خستبووە سەر ئەو ئەسپەی پێغەمبەر (ﷺ) کڕیبووی. پیاوەکە بانگی پێغەمبەری (ﷺ)کردو وتی: ئەگەر تۆ ئەم ئەسپە دەکڕی، بیکڕە ئەگینا فرۆشتومە. پێغەمبەر (ﷺ) کاتیٚ کە گوێی لە دەنگی عەرەبە دەشتەکیەکە بوو هەلّساو فەرمووی: (ئایا لە تۆم نەکڕیوە؟) پیاوە دەشتەکیەکە وتی: نەخێر بەخوا پێم نەفرۆشتوی. پێغەمبەر (ﷺ) فەرمووی: (بەلّکو من لە تۆم کڕیوە) خەلّکی هاتن بۆ لای پێغەمبەرو (ﷺ)دەشتەکیەکە کە قسەیان دەکرد، دەشتەکیەکە دەیوت: وەرە شایەتێك بێنە شایەتی بدات کە من پێم فرۆشتوویت، هەرکەسیٚ دەهات لە موسولّمانان بە عەرەبە دەشتەکیەکەی دەوت: هاوار بۆ تۆ، بێگومان پێغەمبەر هەرگیز هەق نەبیٚ نایلّێت، هەتا خوزەیمە هات گوێی لە قسەی پێغەمبەرو (ﷺ)دەشتەکیەکە بوو دەیوت: سا شایەتێك بێنە شایەتی بدات کە من پێم فرۆشتویت، خوزەیمە وتی: من شایەتی ئەدەم کە تۆ پێت فرۆشتوە، پێغەمبەر (ﷺ) ڕووی کردە خوزەیمەو فەرمووی: (بە چی شایەتی ئەدەی؟) وتی: بە بڕوا کردن بە تۆ ئەی پێغەمبەری

---

[1] البقرة (٢٨٣).

خودا (ﷺ). پێغەمبەری خودا (ﷺ) شایەتی خوزەیمەی بە شایەتی دوو پیاو دانا[1] ئەبوداوودو نەسائیش هەروا ڕیوایەتیان کردوە[2] پاشان خودای مەزن دەفەرمووێت: ﴿وَلَا يُضَآرَّ كَاتِبٌ وَلَا شَهِيدٌ﴾ نابێ نە شایەتەکانتان‌و نە نووسەر زیان بگەیەنن. ئەم بینوسێ بە پێچەوانەی ئەوەی کە بۆی وتراوەو ئەمیش شایەتی بدات بە پێچەوانەی ئەوەی گوێی لێ بووە یان بە تەواوی بیشارێتەوە، ئەمە قسەی حەسەن‌و قەتادەو کەسانی تریشە[3] ﴿وَإِن تَفْعَلُوا فَإِنَّهُۥ فُسُوقٌۢ بِكُمْ﴾ ئەگەر وا نەکەن تاوان لە ملی خۆتانە. واتە: ئەگەر پێچەوانەی ئەوەی فەرمانتان پێ کراوە جوڵانەوەو ئەوەی ڕێگریتان لێ کراوە کردتان، ئەوە تاوانێکەو لە ملی خۆتانەو ناتوانن لە کۆڵی خۆتانی بکەنەوە لێی دەرچن ﴿وَاتَّقُوا اللَّهَ﴾ دەبێ لە خوا بترسن‌و بیکەنە چاودێری خۆتان‌و شوێنی فەرمانەکانی بکەون‌و دوورکەونەوە لە قەدەغەکراوەکانی ﴿وَيُعَلِّمُكُمُ اللَّهُ﴾ خودا فێری کارتان دەکات. وەك ئەم ئایەتە کە خودای گەورە دەفەرمووێت: ﴿يَٰٓأَيُّهَا ٱلَّذِينَ ءَامَنُوا ٱتَّقُوا ٱللَّهَ وَءَامِنُوا بِرَسُولِهِۦ يُؤْتِكُمْ كِفْلَيْنِ مِن رَّحْمَتِهِۦ وَيَجْعَل لَّكُمْ نُورًا تَمْشُونَ بِهِۦ﴾[4] ئەی ئەو کەسانەی خاوەن باوەڕن، ترستان لە خوا هەبێ‌و بڕوا بە پێغەمبەری ئەو بێنن، خودا دووسەرە چاکەتان دەربارە دەکات. ڕووناکیەکتان دەداتێ کە بەهۆی ئەو بە ڕێدا بڕۆن. پاشان لێرەدا دەفەرمووێت: ﴿وَاللَّهُ بِكُلِّ شَيْءٍ عَلِيمٌ﴾ هەر خودایە لە هەموو کارەکان‌و بەرژەوەندی‌و ئاکامیان ئاگادارە، هیچ شتێکی لێ ون نابێ، بەڵکو ئاگاداری تەواوی هەیە بە هەرچی لە بوونەوەر دایە.

﴿وَإِن كُنتُمْ عَلَىٰ سَفَرٍ وَلَمْ تَجِدُوا كَاتِبًا فَرِهَٰنٌ مَّقْبُوضَةٌ فَإِنْ أَمِنَ بَعْضُكُم بَعْضًا فَلْيُؤَدِّ ٱلَّذِى ٱؤْتُمِنَ أَمَٰنَتَهُۥ وَلْيَتَّقِ ٱللَّهَ رَبَّهُۥ وَلَا تَكْتُمُوا ٱلشَّهَٰدَةَ وَمَن يَكْتُمْهَا فَإِنَّهُۥٓ ءَاثِمٌ قَلْبُهُۥ وَٱللَّهُ بِمَا تَعْمَلُونَ عَلِيمٌ ﴿٢٨٣﴾﴾

**ڕوونکردنەوەی بارمتە**

﴿وَإِن كُنتُمْ عَلَىٰ سَفَرٍ﴾ ئەگەر لەسەر سەفەر بوون، قەرزتان لە یەکتری کرد بۆ ماوەیەکی دیاری کراو ﴿وَلَمْ تَجِدُوا كَاتِبًا﴾ نووسەرتان دەست نەکەوت بۆتان بنوسێ. ئیبنوعەبباس وتوویەتی: یانی نوسەرتان دەست کەوت بەڵام کاغەز نەبوو یان مەرەکەب یان قەڵەم دەست نەکەوت، دەبێ بارمتە

[1] أحمد (٢١٥/٥)، فەرموودەیەکی باشە (جيد).

[2] أبوداود (٣١/٤)، النسائي (٣٠١/٧).

[3] الطبري (٨٥/٦-٨٦).

[4] الحديد (٢٨).

وەرگرن. واتە: دەبێ لە باتی نووسینەکە بارمتە بدرێ بە خاوەن هەقەکە، بەڵگەیش ئەم دەقەیە کە خودای گەورە دەفەرموویت: ﴿فَرِهَٰنٌ مَّقۡبُوضَةٌ﴾ دەبێ بارمتە وەرگرن. دیارە بارمتەیش بە وەرگرتن نەبێ نابێت. لە هەردوو سەحیحەکەدا هاتووە لە ئەنەسەوە، کە پێغەمبەری خودا (ﷺ) کۆچی دوایی کرد، زرێکەی (دِرعُهُ) بارمتە بوو لەلای جوولەکەیەك لەسەر سێ ویسق (وسقاً) لە جۆ، کە کردبوویە بارمتە بۆ خۆراکی خێزانەکەی، لە ڕیوایەتێکی ترا هاتووە: لە جوولەکەکانی مەدینە[1] پاشان خودای گەورە دەفەرموویت: ﴿فَإِنۡ أَمِنَ بَعۡضُكُم بَعۡضٗا فَلۡيُؤَدِّ ٱلَّذِي ٱؤۡتُمِنَ﴾ جا مەگین لە یەکتری دڵنیا بن کە ئەوسا بارمتەی ناوێ. با ئەو کەسەی قەرزەکەی لایە قەرزەکەی خۆی بداتەوە. ئیبنوئەبی حاتەم بە سەنەدێکی چاك لە ئەبوسەعیدی خودەریەوە ڕیوایەتی کردوە: ئەم دەقە ئەوەی پێشی خۆی (نەسخ) کردۆتەوە[2]، شەعبی وتی: ئەگەر لە یەکتری دڵنیا بوون، قەیدی نیە، کە نەنووسن و شایەتیش نەگرن.[3]

﴿وَلۡيَتَّقِ ٱللَّهَ رَبَّهُۥ﴾ با قەرزار ترسی خودای لە دڵدا بێ و قەرزەکەی خۆی بداتەوە. وەك ئەم فەرموودەیەی ئیمامی ئەحمەدو خاوەنی فەرموودەکانی تر ڕیوایەتیان کردوە لە ڕیوایەتی قەتادەوە لە حەسەنەوە لە سەمورەوە کە پێغەمبەری خودا فەرموویەتی: (لەسەر ئەو دەستەیە کە وەری گرتوە هەتا ئەیداتەوە)[4] (واتە: لەسەر ئەو کەسەیە کە قەرزەکەی کردوە، دەبێ خۆی بیداتەوە) ﴿وَلَا تَكۡتُمُواْ ٱلشَّهَٰدَةَ﴾ ئەو کەسانەی شایەتیشن ئەو شایەتیە نەشارنەوە، واتە: خۆیانی لێ لانەدەن و پشت گوێی نەخەن، ئیبنوعەبباس و کەسانی تریش وتویانە: شایەتی درۆ لە گەورەترین گوناهەو شاردنەوەشی هەر وەهایە[5] سوودی وتی: یانی بە دڵ خۆی تووشی خراپە دەکا[6] هەر بۆیە خودای گەورە دەفەرموویت: ﴿وَمَن يَكۡتُمۡهَا فَإِنَّهُۥٓ ءَاثِمٞ قَلۡبُهُۥ﴾ هەرکەسێ بیشارێتەوە بە دڵ خۆی تووشی گوناه دەکات. ئەم ئایەتە وەك ئەو ئایەتە وایە کە خودای گەورە دەفەرموویت: ﴿وَلَا نَكۡتُمُ شَهَٰدَةَ ٱللَّهِ إِنَّآ إِذٗا لَّمِنَ ٱلۡأٓثِمِينَ﴾[7] وە شایەتیدان بۆ خودا ناشارینەوە، بێگومان (ئەگەر شایەتیەکەمان شاردەوە)

---

[1] فتح الباري (٤/٣٥٤)، مسلم (٣/١٢٢٦)، عن عائيشة.

[2] إبن أبي حاتم غ: (٣/٣/١٢٠٢).

[3] إبن أبي حاتم غ: (٣/٣/١٢٠٣).

[4] أحمد (٥/١٣)، أبوداود (٣/٨٢٢)، تحفة الاحوذي (٤/٤٨٢)، النسائي في الكبرى (٣/٤١١)، إبن ماجة (٢/٨٠٢).

[5] الطبري (٦/١٠٠).

[6] الطبري (٦/١٠٠).

[7] المائدة (١٠٦).

ئێمە پێی تاوانبار دەبین. خودای مەزن لە ئایەتێکی تریشدا دەفەرمووێت: ﴿يَٰٓأَيُّهَا ٱلَّذِينَ ءَامَنُواْ كُونُواْ قَوَّٰمِينَ بِٱلۡقِسۡطِ شُهَدَآءَ لِلَّهِ وَلَوۡ عَلَىٰٓ أَنفُسِكُمۡ أَوِ ٱلۡوَٰلِدَيۡنِ وَٱلۡأَقۡرَبِينَۚ إِن يَكُنۡ غَنِيًّا أَوۡ فَقِيرٗا فَٱللَّهُ أَوۡلَىٰ بِهِمَاۖ فَلَا تَتَّبِعُواْ ٱلۡهَوَىٰٓ أَن تَعۡدِلُواْۚ وَإِن تَلۡوُۥٓاْ أَوۡ تُعۡرِضُواْ فَإِنَّ ٱللَّهَ كَانَ بِمَا تَعۡمَلُونَ خَبِيرٗا﴾[1] ئەی ئەو کەسانەی خاوەن باوەڕن، بە یەکسانیو بێ جیاوازی (بە کاری خەڵکی ڕابگەن)و بۆ خوداش شایەتیبدەن. هەرچەندە شایەتی دانەکەتان بە زیانی خۆتانو دایكو بابتانو خزمانیشتان بێ، (ئەگەر شایەتی بۆ دراوانیش) دەوڵەمەند بن یان هەژار بن، خوا بۆ ئەوان دڵسۆزترە، شوێن ئارەزوتان مەکەون، ئەوا لە ڕێگە لابدەن، ئەگەر (شایەتیەکە) پێچەوانە بدەن یان خۆتان لە شایەتیدان بدزنەوە، لە هەر کارێ ئێوە دەیکەن، خودا هەمیشە ئاگادارە. هەر بەو شێوەیەش لێرەدا دەفەرمووێت: ﴿وَلَا تَكۡتُمُواْ ٱلشَّهَٰدَةَۚ وَمَن يَكۡتُمۡهَا فَإِنَّهُۥٓ ءَاثِمٞ قَلۡبُهُۥۗ وَٱللَّهُ بِمَا تَعۡمَلُونَ عَلِيمٞ﴾ شایەتیەکانتان مەشارنەوە، هەرکەسێ بیشارێتەوە بە دڵ خۆی تووشی گوناه دەکاو خودا بە گشت کارتان دەزانێ.

﴿لِّلَّهِ مَا فِي ٱلسَّمَٰوَٰتِ وَمَا فِي ٱلۡأَرۡضِۗ وَإِن تُبۡدُواْ مَا فِيٓ أَنفُسِكُمۡ أَوۡ تُخۡفُوهُ يُحَاسِبۡكُم بِهِ ٱللَّهُۖ فَيَغۡفِرُ لِمَن يَشَآءُ وَيُعَذِّبُ مَن يَشَآءُۗ وَٱللَّهُ عَلَىٰ كُلِّ شَيۡءٖ قَدِيرٌ ﴿٢٨٤﴾﴾

**ئایا خودا لێپرسینەوە لەگەڵ عەبدەکانیدا دەکات لەسەر ئەوەی لە دڵیاندا شاردویانەتەوە**

خودای مەزن باسی ئەوە دەکات کە خۆی خاوەنی ئاسمانەکانو زەمینەو ئەوەی تێیاندایەو ئەوەیش لە نێوانیاندایە، ئاشکراو نهێنی دڵیشی لا شاراوە نیە هەرچەندە بچووكو نادیاریش بێ، فەرموویەتی کە بەو زووانە دەپرسێتەوە لە عەبدەکانی لەسەر ئەو شتانەی کردویانەو ئەوەیش لەناو دڵیاندا شاردویانەتەوە. وەك لەم ئایەتەدا دەفەرمووێت: ﴿قُلۡ إِن تُخۡفُواْ مَا فِي صُدُورِكُمۡ أَوۡ تُبۡدُوهُ يَعۡلَمۡهُ ٱللَّهُۗ وَيَعۡلَمُ مَا فِي ٱلسَّمَٰوَٰتِ وَمَا فِي ٱلۡأَرۡضِۗ وَٱللَّهُ عَلَىٰ كُلِّ شَيۡءٖ قَدِيرٞ﴾[2] بڵێ: ئەوەی وا لە دڵتاندایە ئەگەر بیشارنەوە یان دەریخەن، خودا دەیزانێو لە هەرچیەکیش لە ئاسمانانو زەمیندایە، ئاگادارەو خودا توانای بەسەر هەموو شتێکا هەیە. هەروەها دەفەرمووێت: ﴿يَعۡلَمُ ٱلسِّرَّ وَأَخۡفَى﴾[3] ئەو بە ڕازو نزمتریش دەزانێ. ئایەت لەم بارەیەوە ئێجگار زۆرە، کەخودا زۆر ئاگادارە لە هەموو شتێك خۆی لێپرسینەوەی لەسەر دەکات. بۆیە کاتێ کە ئەم ئایەتە هاتە خوارەوە زۆر گرانو ناڕەحەت بوو لەلای هاوەڵەکانی

---

[1] النساء (١٣٥).

[2] آل عمران (٢٩).

[3] طه (٧).

پێغەمبەری خودا (ﷺ)، زۆر ترسان لە لێپرسینەوەی خودای مەزن لە گەورەو بچووکی کردارەکانیان، ئەمەیش لەبەر پتەوی بڕوایان بوو بە خودای گەورە. ئیمامی ئەحمەد ڕیوایەتی کردوە لە ئەبوهورەیرەوە، وتی: کاتێ ئەم ئایەتە هاتە خوارەوە بۆ پێغەمبەری خودا (ﷺ). ﴿لِّلَّهِ مَا فِى ٱلسَّمَٰوَٰتِ وَمَا فِى ٱلْأَرْضِ ۗ وَإِن تُبْدُوا۟ مَا فِىٓ أَنفُسِكُمْ أَوْ تُخْفُوهُ يُحَاسِبْكُم بِهِ ٱللَّهُ ۖ فَيَغْفِرُ لِمَن يَشَآءُ وَيُعَذِّبُ مَن يَشَآءُ ۗ وَٱللَّهُ عَلَىٰ كُلِّ شَىْءٍ قَدِيرٌ﴾ سەر بە خوایە هەرچی لە ئاسمانەکان‌و زەمیندایە، ئەوەی لە ناو دڵتاندایە (چ دەری خەن، چ بیشارنەوە) خودا لەو بارەیەوە لە ئێوە دەپرسێتەوە. هەرکەسێ بۆ خۆی ویستی لێ بێ، لێی دەبووری، هەرکەسێکیش خۆی حەز بکا سزای ئەدا، هەر خودایە توانای بەسەر هەموو شتێکا هەیە. ئەمە زۆر کاریگەر بوو لەسەر دڵی هاوەڵەکانی پێغەمبەر (ﷺ)، هەر بۆیە هاتنە خزمەتی‌و چۆکیان داداو وتیان: ئەی پێغەمبەری خودا، ئەوەندە ئەرک‌و فەرمان دراوە بەسەرماندا لە تواناماندا نیە: نوێژو ڕۆژوو جیهاد، خێرکردن. ئێستاش ئەم ئایەتەت بۆ هاتۆتە خوارەوە لە تواناماندا نیە. پێغەمبەری خودا فەرمووی: (بۆ ئێوەش دەتانەوێ وەك نەسرانی‌و جوولەکەکانی پێش خۆتان بڵێن: دەبیستین‌و سەرپێچیش دەکەین، نا بەڵکو ئێوە بڵێن: بیستمان‌و گوێڕایەڵیشین، داوای لێخۆش بوونت لێ دەکەین، پەروەردگارمان! گەڕانەوەشمان هەر بۆ لای تۆیە)، کاتێ ئەو خەڵکە دانیان پێدانا‌و زمانیان لەسەر ڕاهات، ئیتر خودا بە شوێنیدا ئەم ئایەتەی نارد. ﴿ءَامَنَ ٱلرَّسُولُ بِمَآ أُنزِلَ إِلَيْهِ مِن رَّبِّهِۦ وَٱلْمُؤْمِنُونَ ۚ كُلٌّ ءَامَنَ بِٱللَّهِ وَمَلَٰٓئِكَتِهِۦ وَكُتُبِهِۦ وَرُسُلِهِۦ لَا نُفَرِّقُ بَيْنَ أَحَدٍ مِّن رُّسُلِهِۦ ۚ وَقَالُوا۟ سَمِعْنَا وَأَطَعْنَا ۖ غُفْرَانَكَ رَبَّنَا وَإِلَيْكَ ٱلْمَصِيرُ﴾ ئەم پێغەمبەرەو ئەوانەی لەگەڵ ئەو باوەڕیان هێناوە، لێیان ڕوونە کە ئەو شتە لەلایەن پەروەردگاریان هاتۆتە خوار بۆ لایان، بڕوا دەکەن بە خوداو فریشتەکان‌و کتێبانی‌و سەرلەبەر پێغەمبەرانی‌و دەڵێن: ئێمە بۆ هیچ لا لە پێغەمبەران جیاوازی دانانێین، فەرموودەی خودامان بیست‌و گوێڕایەڵیمان کرد، ئەی پەروەردگاری هەمووومان بمانبەخشەو هەر دەگەڕێینەوە بۆ لای تۆ. کاتێ ئەوەیان کرد، خودای گەورە سەرەتای ئایەتەکەی (نەسخ) کردەوەو ئەم ئایەتەی نارد ﴿لَا يُكَلِّفُ ٱللَّهُ نَفْسًا إِلَّا وُسْعَهَا ۚ لَهَا مَا كَسَبَتْ وَعَلَيْهَا مَا ٱكْتَسَبَتْ ۗ رَبَّنَا لَا تُؤَاخِذْنَآ إِن نَّسِينَآ أَوْ أَخْطَأْنَا﴾[1] خودا ئەرکی لە توانا بەدەر، بەسەر کەسدا ناسەپێنێ، چاکە بکا بۆ خۆیەتی‌و خراپەشی دژی خۆیەتی، ئەی پەروەردگاری هەمووومان! ئەگەر شتێکمان لەبیر چوو، یان تیا بەهەڵە چووین، لێمان مەگرە(تا کۆتایی ئایەتەکە). موسلیمش هەر وا ڕیوایەتی کردوە دەڵێ: کاتێ ئەوەیان کرد خودای مەزن

[1] أحمد (٢/٤١٢)، سەحیحە.

سەرەتای ئایەتەکەی (نەسخ) کردەوەو ئەم ئایەتەی ناردە خوارەوە: ﴿لَا يُكَلِّفُ اللَّهُ نَفْسًا إِلَّا وُسْعَهَا لَهَا مَا كَسَبَتْ وَعَلَيْهَا مَا اكْتَسَبَتْ رَبَّنَا لَا تُؤَاخِذْنَا إِن نَّسِينَا أَوْ أَخْطَأْنَا﴾ خودای مەزن فەرمووی: بەڵێ، ﴿رَبَّنَا وَلَا تَحْمِلْ عَلَيْنَا إِصْرًا كَمَا حَمَلْتَهُ عَلَى الَّذِينَ مِن قَبْلِنَا﴾ فەرمووی: بەڵێ، ﴿وَلَا تُحَمِّلْنَا مَا لَا طَاقَةَ لَنَا بِهِ﴾ فەرمووی: بەڵێ: ﴿وَاعْفُ عَنَّا وَاغْفِرْ لَنَا وَارْحَمْنَا أَنتَ مَوْلَانَا فَانصُرْنَا عَلَى الْقَوْمِ الْكَافِرِينَ﴾ فەرمووی: بەڵێ[1]: ئیمامی ئەحمەد لە موجاهیدەوە ڕیوایەتی کردووە ، وتی: چوومە لای ئیبنوعەبباس‌و وتم: ئەی ئیبنوعەبباس، من لە لای ئیبنوعومەر بووم ئەم ئایەتەی خوێندەوەو گریا، وتی: کام ئایەت؟ وتم: ﴿وَإِن تُبْدُوا مَا فِي أَنفُسِكُمْ أَوْ تُخْفُوهُ﴾ ئیبنوعەبباس وتی: ئەم ئایەتە کاتێ کە هاتە خوارەوە، هاوەڵەکانی پێغەمبەر (ﷺ) زۆر خەفەتیان خواردو زۆر دڵگران بوون‌و وتیان: ئەی پێغەمبەری خودا (ﷺ) تیا چووین، ئەگەر لێپرسینەوەمان لەگەڵا بکرێ لەسەر ئەوەی وتوومانەو کردوومانە، خۆ دڵەکانمان بە دەستی ئێمە نیە، پێغەمبەری خودا (ﷺ) پێی وتن: (قولوا سمعنا و أطعنا) وتیان: بیستمان‌و گوێڕایەڵین. وتی: خودا ئەم ئایەتەی (نەسخ) کردەوە: ﴿آمَنَ الرَّسُولُ بِمَا أُنزِلَ إِلَيْهِ مِن رَّبِّهِ وَالْمُؤْمِنُونَ كُلٌّ آمَنَ بِاللَّهِ﴾ هەتا دەگاتە: ﴿لَا يُكَلِّفُ اللَّهُ نَفْسًا إِلَّا وُسْعَهَا لَهَا مَا كَسَبَتْ وَعَلَيْهَا مَا اكْتَسَبَتْ﴾ چاوپۆشی لێکردن لە وتەی ناو دڵ (حديث النفس) تەنیا لەسەر کردار لێپرسینەوەیان لەگەڵدا دەکرێت.[2] هەر شەش زانایانی فەرموودە، لە کتێبەکانیاندا لە ئەبوهورەیرەوە ڕیوایەتیان کردوە وتی: پێغەمبەری خودا (ﷺ) فەرموویەتی: (خودا چاوپۆشی لە من کردوە دەربارەی ئوممەتەکەم لەوەی کە بە دڵیاندا دێ، بە مەرجێ کە نەیڵێ یا نەیکات).[3] لە هەردوو سەحیحەکەدا هاتووە لە ئەبوهورەیرەوە وتی: پێغەمبەری خودا (ﷺ) فەرموویەتی: (کاتێ بەندەکەم خراپەیە هات بە دڵیا لەسەری مەنوسن ئەگەر کردی یەك خراپەی لەسەر بنووسن. ئەگەر چاکەیەك هات بە دڵیاو نەیکرد، یەك چاکەی بۆ بنووسن. ئەگەر چاکەکەی کرد دە چاکەی بۆ بنوسن)[4].

---

[1] فتح الباري (٧١٢/٨)، (٣٦٩/٧)، مسلم (٥٥٤/١).

[2] أحمد (١١٨/٤)، سەحیحە.

[3] فتح الباري (٣٠٠/٩)، مسلم (١١٧/١)، أبوداود (٦٥٧/٢)، تحفة الاحوذي (٣٦١/٤)، النسائي (١٥٦/٦)، إبن ماجة (٦٥٨/١).

[4] فتح الباري (٤١٣/١٣)، مسلم (١٥٧/١).

﴿ءَامَنَ ٱلرَّسُولُ بِمَآ أُنزِلَ إِلَيۡهِ مِن رَّبِّهِۦ وَٱلۡمُؤۡمِنُونَۚ كُلٌّ ءَامَنَ بِٱللَّهِ وَمَلَٰٓئِكَتِهِۦ وَكُتُبِهِۦ وَرُسُلِهِۦ لَا نُفَرِّقُ بَيۡنَ أَحَدٖ مِّن رُّسُلِهِۦۚ وَقَالُواْ سَمِعۡنَا وَأَطَعۡنَاۖ غُفۡرَانَكَ رَبَّنَا وَإِلَيۡكَ ٱلۡمَصِيرُ (٢٨٥) لَا يُكَلِّفُ ٱللَّهُ نَفۡسًا إِلَّا وُسۡعَهَاۚ لَهَا مَا كَسَبَتۡ وَعَلَيۡهَا مَا ٱكۡتَسَبَتۡۗ رَبَّنَا لَا تُؤَاخِذۡنَآ إِن نَّسِينَآ أَوۡ أَخۡطَأۡنَاۚ رَبَّنَا وَلَا تَحۡمِلۡ عَلَيۡنَآ إِصۡرٗا كَمَا حَمَلۡتَهُۥ عَلَى ٱلَّذِينَ مِن قَبۡلِنَاۚ رَبَّنَا وَلَا تُحَمِّلۡنَا مَا لَا طَاقَةَ لَنَا بِهِۦۖ وَٱعۡفُ عَنَّا وَٱغۡفِرۡ لَنَا وَٱرۡحَمۡنَآۚ أَنتَ مَوۡلَىٰنَا فَٱنصُرۡنَا عَلَى ٱلۡقَوۡمِ ٱلۡكَٰفِرِينَ (٢٨٦)﴾

**باسی ئەو فەرموودانەی لەبارەی ئەم دوو ئایەتەوە هاتووە، خودا سوودمان پێ بگەیەنێ پێیان**

بوخاری لە ئیبنومەسعودەوە ڕیوایەتی کردوە وتی: پێغەمبەری خودا (ﷺ) فەرموویەتی: (هەرکەسێ ئەم دوو ئایەتەی کۆتایی سورەتی (البقرة) لە شەوێکدا بخوێنێ، بەسیەتی)[١] زانایانی تری فەرموودەیش هەر بەم شێوەیە[٢] ڕیوایەتیان کردووە.لە هەردوو سەحیحەکەیشدا بە چەند ڕێگای تریش هاتووە[٣] ئیمامی ئەحمەدیش هەر ڕیوایەتی کردوە[٤] . موسلیم لە عەبدوڵڵاوە ڕیوایەتی کردوە وتی: کە پێغەمبەر (ﷺ) شەوڕەوی پێکرا، بردیان تا لای (سدرة المنتهى) کە لە ئاسمانی شەشەمە، لەوێوە ئەوەی لە زەمینەوە بەرزێتە لای خودا تا ئەوێ دەچێ، لەوێوە وەردەگیرێت، ئەوەی لە سەرەوە بێتە خوار، هەر لەوێوە وەردەگیرێت (بەسەر ئاسمانانو زەمیندا دابەش دەکرێ ) ﴿إِذۡ يَغۡشَى ٱلسِّدۡرَةَ مَا يَغۡشَىٰ﴾ لەکاتێکدا کەنارەکە داپۆشیوە ئەوەی کە دەبێ داپۆشێ. وتی: ئەوەی (سیدرە) دایدەپۆشێ فەرشێکی ئاڵتونە. وتی: پێغەمبەری خودا (ﷺ) سێ شتی پێدرا: پێنج نوێژەکەی پێدرا، دوو ئایەتی کۆتایی سورەتی بەقەرەی پێدرا. هەرکەسێ لە ئوممەتەکەی هیچ شتێك نەکا بە شەریکی خودای مەزن لە گوناهی گەورەو لەناوبەری خۆش دەبێ[٥]، لە پێشەوە لە سورەتی فاتحەدا باسکرا لە ئیبنوعەبباسەوە، وتی: لە کاتێکدا جوبرەئیل لەلای پێغەمبەری خودا بوو (ﷺ) لەو کاتەدا گوێی لە دەنگێك بوو لە ژوور سەریەوە، جوبرەئیل سەری بەرز کردەوە بەرەو ئاسمان، وتی: ئەوە دەرگایەکی ئاسمان بوو کرایەوە، کە هەرگیز نەکراوەتەوە. وتی: فریشتەیەکی لێ هاتە خوارەوە هاتە لای پێغەمبەر(ﷺ) وتی: مژدە بێت دوو ڕووناکیت پێدراوە، بە هیچ پێغەمبەرێك پێش تۆ نەدراوە.

---

[١] فتح الباري (٦٧٢/٨).

[٢] مسلم (٥٥٥/١)، أبوداود (١١٨/٢)، تحفة الاحوذي (١٨٨/٨)، النسائي في الكبرى (١٤/٥)، إبن ماجة (٤٣٥/١).

[٣] فتح الباري (٧١٢/٨)، (٣٦٩/٧)، مسلم (٥٥٤/١).

[٤] أحمد (١١٨/٤).

[٥] مسلم (١٥٧/١).

سوورەتی فاتیحەو کۆتایی سورەتی بەقەرە هەر پیتێك لە هەر کامیان بخوێنی (هەر داخوازیەکی تێدا بێت) خودا پێت دەبەخشێ[1].

## تەفسیری ئەم دوو ئایەتە

پاشان خودای مەزن باسی گشت موسوڵمانان دەکاتو دەفەرموێت: ﴿ءَامَنَ ٱلرَّسُولُ بِمَآ أُنزِلَ إِلَيۡهِ مِن رَّبِّهِۦ وَٱلۡمُؤۡمِنُونَۚ كُلٌّ ءَامَنَ بِٱللَّهِ وَمَلَٰٓئِكَتِهِۦ وَكُتُبِهِۦ وَرُسُلِهِۦ لَا نُفَرِّقُ بَيۡنَ أَحَدٖ مِّن رُّسُلِهِۦ﴾ ئەم پێغەمبەرەو ئەوانەی لەگەڵ ئەو باوەڕیان هێناوە، لێیان ڕوونە کە ئەو شتە لەلایەن پەروەردگاریان هاتۆتە خوارێ بۆ لایان. بڕوا دەکەن بە خوداو فریشتەکانیو کتێبانیو هەموو پێغەمبەرانیو دەڵێن: ئێمە بۆ هیچ کەسێ لە پێغەمبەرانی جیاوازی دانانێین. هەموو خاوەن باوەڕان بڕوایان هەیە کە خودا تاكو تەنیایەو هەر ئەو جێ نیازە، هیچ پەرستراوێ نیە غەیرەز ئەو، پەروەردگاریش هەر ئەوە. بڕواشیان بە هەموو پێغەمبەران هەیەو ئەو کتێبانەشی کە لە ئاسمانەوە هاتۆتە خوارەوە بۆ ئەو پێغەمبەرانە، جیاوازی ناکەن لە نێوان هیچ پێغەمبەرێکا، بڕوایان بە هەندێکیان ببێو بڕوایان بە هەندێکی تریان نەبێ. بەڵکو هەموو پێغەمبەران (سەلامی خوایان لێ بێ) ڕاستیان فەرمووە ڕێنمایی خەڵکیان کردوەو ڕێنیشاندەریان بوون بۆ سەر ڕاستە ڕێ. هەرچەندە هەندێکیان شەریعەتی هەندێکیانی (نەسخ) کردۆتەوە بە ئیزنی خودا. هەتا ئاینی گشت پێغەمبەران بە هاتنی ئاینی موحەممەد (ﷺ) کە ئاینی ئیسلامەو دواین پێغەمبەرە کە ڕۆژی قیامەت لەسەر ئەم ئاینە دێت. بەردەوام کۆمەڵێ لە ئوممەتەکەی لەسەر هەق دەمێننەوە. ﴿وَقَالُواْ سَمِعۡنَا وَأَطَعۡنَا﴾ وتیان: فەرموودەی خودامان بیستو گوێڕایەڵین. واتە: ئەی خودایە فەرموودەی تۆمان بیستو لێی تێگەیشتین، پێی هەڵساین بەو شێوەی کە فەرمانت پێدواین. ﴿غُفۡرَانَكَ رَبَّنَا وَإِلَيۡكَ ٱلۡمَصِيرُ﴾ ئەی پەروەردگاری هەموومان بمان بەخشەو هەر دەگەڕێینەوە لای تۆ. ﴿لَا يُكَلِّفُ ٱللَّهُ نَفۡسًا إِلَّا وُسۡعَهَا﴾ خودا ئەرکی لە توانا بەدەر بەسەر کەسدا ناسەپێنێ. ئەمەیش لە سۆزو بەزەیی خودایە دەربارەی عەبدەکانیو چاکەیە لەگەڵیان. ئەوسا ئەوەی لەسەر شانی هاوەڵەکانی پێغەمبەر (ﷺ) زۆر گران بووە (نەسخ)ی کردۆتەوە لەم دەقەدا کە دەفەرموێت: ﴿وَإِن تُبۡدُواْ مَا فِيٓ أَنفُسِكُمۡ أَوۡ تُخۡفُوهُ يُحَاسِبۡكُم بِهِ ٱللَّهُۖ﴾ ئەوەی لەناو دڵتاندایە (چ دەریبڕن چ بیشارنەوە) خودا لەو بارەیەوە لە ئێوە دەپرسێتەوە. واتە: خودا دەپرسێتەوەو بەڵام سزای هیچ کەسێ نادا لەسەر ئەوەی توانای نیە لە خۆی لابدا، لە نیازو وەسوەسەی ناو دڵ، ئەو ئەرکە ناخرێتە سەر مەردم. ناڕەحەتیو وەسوەسەی خراپ لە نیشانەی

---

[1] مسلم (١/٥٥٤)، النسائي في الكبرى (٥/١٢).

باوەڕە. ﴿لَهَا مَا كَسَبَتْ وَعَلَيْهَا مَا ٱكْتَسَبَتْ﴾ چاکە بکات بۆ خۆیەتیو خراپەیشی دژی خۆیەتی. لەو کردارانەی کە مرۆڤ توانای هەیە بەسەریدا. پاشان خودای گەورە ڕێنمایی عەبدەکانی دەکات کە داوای لێ بکەن بەڵێنیشی پێداون کە لێیان وەرگرێ. وەك چۆن ڕێنمایی کردوونو فێری کردوون کە بڵێن: ﴿رَبَّنَا لَا تُؤَاخِذْنَآ إِن نَّسِينَآ أَوْ أَخْطَأْنَا﴾ ئەی پەروەردگاری هەمووومان، ئەگەر شتێکمان لەبیرچوو یان بەهەڵە چووین، لێمان مەگرە. ئەگەر فەرزێکمان لەبیرچوو یان کارێکی خراپمان کرد، کە لە سەحیحی موسلیما هاتبوو لە ئەبوهورەیرەوە، وتی: (خودای مەزن فەرمووی: بەڵێ).[1] وە لە فەرموودەکەی ئیبنوعەبباسدا خودای مەزن فەرمووی: (بێگومان کردم)[2] ﴿رَبَّنَا وَلَا تَحْمِلْ عَلَيْنَآ إِصْرًا كَمَا حَمَلْتَهُۥ عَلَى ٱلَّذِينَ مِن قَبْلِنَا﴾ ئەی پەروەردگاری هەمووومان ئەرکی ئەوەندە گرانمان مەخە سەرشان وەك ئەوانەی بەرلەئێمەلەسەریانبوو. زۆر گرانو نارەحەت بوو. لەسەریان، کە تۆئەم پێغەمبەرە(ﷺ) بەسۆزو بەزەییەت ناردوەو بەم ئاینە پیرۆزە ئاسانو لێبوردەوە. لە سەحیحی موسلیمدا هاتووە لە ئەبوهورەیرەوە لە پێغەمبەری خوداوە (ﷺ) کە فەرموویەتی: (خودا فەرموویەتی: بەڵێ)[3] لە ئیبنوعەبباسەوە لە پێغەمبەری خوداوە (ﷺ) فەرموویەتی: (خودا فەرموویەتی: بێگومان کردم)[4]. ئەم فەرموودەیەش لە چەند ڕێگاوە هاتووە لە پێغەمبەری خوداوە (ﷺ) کە فەرموویەتی: (ڕەوانە کراوم بەم (ئاینە) ڕاستو ڕوونو بەخشندەوە).[5] پاشان دەفەرمووێت: ﴿رَبَّنَا وَلَا تُحَمِّلْنَا مَا لَا طَاقَةَ لَنَا بِهِۦ﴾ ئەی پەروەردگاری هەمووومان ئەرکی وامان پێ مەسپێرە کە لە توانامان بەدەر بێ. واتە: تووشی بەڵاو کارەساتی وامان مەکە هیچ توانایەکمان بەسەریا نەبێ. (مەکحول) لەم دەقەدا کە خودای مەزن دەفەرمووێت: ﴿رَبَّنَا وَلَا تُحَمِّلْنَا مَا لَا طَاقَةَ لَنَا بِهِۦ﴾ وتی: (تووشی) دەربەدەریو ئارەزوومان مەکە.[6] ئیبنوئەبی حاتەم ڕیوایەتی کردوە: (خودا فەرموویەتی: بەڵێ) لە فەرموودەیەکی تردا هاتووە: (خودا فەرموویەتی: بێگومان کردوومە) ﴿وَٱعْفُ عَنَّا﴾ تۆ هەر خۆت لێمان ببورە. ﴿وَٱغْفِرْ لَنَا﴾ بەر بەزەیی خۆتمان بخەو بمانبەخشە واتە: ئەوەیش لە نێوان عەبدەکانتاو ئێمەدایە لە تاوانو کردارە خراپەکانمان

---

[1] مسلم (١/١١٥).

[2] مسلم (١/١١٦).

[3] مسلم (١/١١٥).

[4] مسلم (١/١١٦).

[5] أحمد (٥/٢٦٦)، (٦/١١٦/٢٣٣)، ئەم فەرموودەیە سەنەدەکانی لاوازە.

[6] إبن أبي حاتم غ: (٣/١٢٣٥).

ئاگاداریان مەکە لێی ﴿وَٱرۡحَمۡنَآ﴾ بەزەیت پێماندا بێتەوەو بمانبەخشە، لەوەی کە ڕووبەڕوومان دەبێتەوە، یارمەتیمان بدەو تووشی تاوانی تر نەبین. هەر بۆیە دەڵێن: تاوانبار پێویستی بە سێ شت هەیە: ئەوەی لە نێوانو ئەوو خوادایە خودا چاوپۆشی لێ بکات. لە عەبدەکانی بشارێتەوەو ئابڕوی نەبات پێی لەناویاندا. خوا پارێزگاری لێ بکاتو لای بداتو تووشی تاوانی تری وەك ئەو تاوانانەی نەکات کە کردوویەتی. لە پێشەوەش لە فەرموودەکەدا باس کرا کە خودای مەزن فەرموویەتی: (بەڵێ) لە فەرموودەیەکی تریشدا هاتووە: (خودا فەرموویەتی: بێگومان کردوومە). پاشان خودای مەزن دەفەرمووێت: ﴿أَنتَ مَوۡلَىٰنَا فَٱنصُرۡنَا عَلَى ٱلۡقَوۡمِ ٱلۡكَٰفِرِينَ﴾ هەموو کاروبارێکی ئێمە بەدەس تۆیەو سەریشمانخەی بەسەر ئەوانەی خوانەناسن. واتە: هەر تۆ ئەی خودایە دۆستو یارمەتی دەرمانی، پشتو پەنامانی، داوای هاوکاری هەر لە تۆ دەکەین، سەرمانخە بەسەر ئەوانەدا بڕوا بە ئاینەکەت ناکەنو تۆ بە تاكو تەنیا نازانن، سەرپێچی پەیامی پێغەمبەرەکەت دەکەنو غەیرەز تۆ دەپەرستنو عەبدەکانت دەکەنە شەریکت. لە دنیاو لە قیامەتدا سەرکەوتومان بکە بەسەریاندا: (خودای مەزن فەرمووی: بەڵێ) لەو فەرموودەیەشدا کە موسلیم ڕیوایەتی کردووە لە ئیبنوعەبباسەوە هاتووە: (خودای مەزن فەرموویەتی: بێگومان کردوومە) ئیبنوجەریر ڕیوایەتی کردوە لە ئەبوئیسحاقەوە کاتێ کە (خوێندنی) ئەم سورەتەی تەواو دەکرد ﴿فَٱنصُرۡنَا عَلَى ٱلۡقَوۡمِ ٱلۡكَٰفِرِينَ﴾ دەیوت: ئامین[1].

---

[1] الطبري (١٤٦/٦).

## تەفسیری سورەتی (آل عمران)

## لە مەدینەدا هاتوەتە خوارەوە

چونکە ئەم سورەتە لە سەرەتاکەیەوە هەتا ئایەتی هەشتاوسیّ لەسەر شاندی (وەفدی) نەجران هاتۆتە خوار. هاتنیشیان لە سالّی نۆی کۆچیدا بووە، وەك بەو زوانە لە تەفسیری ئایەتی نەفرین کردن (المباهلة) باسی دیّت بە ویستی خودای مەزن. باسی ئەو فەرموودانەشمان کرد لە باسی ئەم سورەتەدا لەگەلّ سەرەتای تەفسیری سورەتی بەقەرەدا.

بِسْمِ اللَّهِ الرَّحْمَٰنِ الرَّحِيمِ

﴿الٓمٓ ۝١ اللَّهُ لَآ إِلَٰهَ إِلَّا هُوَ الْحَيُّ الْقَيُّومُ ۝٢ نَزَّلَ عَلَيْكَ الْكِتَٰبَ بِالْحَقِّ مُصَدِّقًا لِّمَا بَيْنَ يَدَيْهِ وَأَنزَلَ التَّوْرَىٰةَ وَالْإِنجِيلَ ۝٣ مِن قَبْلُ هُدًى لِّلنَّاسِ وَأَنزَلَ الْفُرْقَانَ إِنَّ الَّذِينَ كَفَرُوا بِـَٔايَٰتِ اللَّهِ لَهُمْ عَذَابٌ شَدِيدٌ وَاللَّهُ عَزِيزٌ ذُو انتِقَامٍ ۝٤﴾

ئەو فەرموودەیەی باسی ناوە هەرە مەزنەکەی خودای کردووە (إسم الله الاعظم) لەم دوو ئایەتەدایە ﴿اللَّهُ لَآ إِلَٰهَ إِلَّا هُوَ الْحَيُّ الْقَيُّومُ﴾ وە ﴿الٓمٓ ۝١ اللَّهُ لَآ إِلَٰهَ إِلَّا هُوَ الْحَيُّ الْقَيُّومُ﴾ تەنها خودا ماناکەی دەزانیّ بە (ألیف، لام، میم) دەخویّنریّتەوە، غەیرەز خودا هیچ شتیّك بۆ پەرستن ناشیّ. هەر زیندوەو بەسەر هەموو شت ڕادەگات (لە تەفسیری) (آیة الکرسي)دا قسەی لیّکرا. (الم)یش لەسەرەتای سوورەتی (بەقەرەدا) باسی کرا، پیّویست ناکات جاریّکی تر دووبارە بکریّنەوە. خودای گەورە دەفەرموویّت: ﴿نَزَّلَ عَلَيْكَ الْكِتَٰبَ بِالْحَقِّ﴾ ئەم کتیّبەی (بە ڕاست) کە بۆ تۆم ناردووە. واتە: ناردنی قورئان بۆ تۆ ئەی موحەممەد (ﷺ) بە ڕاستی، واتە: هیچ گومانو دوودلّیەکی تیّدا نیە، بەلّکو لەلایەن خوداوە هاتووەو بە ئاگاداری خۆی ڕەوانە کراوە، فریشتەکانیش شایەتی ئەدەن، خودا خۆی بەسە شایەت بیّ ﴿مُصَدِّقًا لِّمَا بَيْنَ يَدَيْهِ﴾ باوەڕ بەو کتیّبانەش دەکات کە پیّش لەولە خوداوە ڕەوانە کراون لە ئاسمانەوە بۆ پیّغەمبەرەکان، باوەڕیش بەو هەوالّانەدەکات کە ئەو کتیّبانە باسیان کردوەو لە دیّر زەمانەوە مژدەیان پیّداوە، چونکە وەك ئەو هەوالّە وایە کە ئەم باسی کردووەو مژدەی پیّداوە کە بەلّیّندانە بە ناردنی موحەممەدو (ﷺ) ڕەوانە کردنی قورئانی پیرۆزە بۆی. ﴿وَأَنزَلَ التَّوْرَىٰةَ وَالْإِنجِيلَ﴾ تەوراتو ئینجیلیشی نارد بۆ موسای کوڕی عیمرانو عیسای کوڕی مەریەم (سەلامی خوایان لیّ بیّ). ﴿مِن قَبْلُ هُدًى لِّلنَّاسِ﴾ لە پیّش (قورئاندا) تا ڕیّنیشاندەر بن بۆ خەلّك. ﴿وَأَنزَلَ الْفُرْقَانَ﴾ فورقانیش (قورئانیشی لەوەودوا) نارد. کە ڕیّی ڕاستی لە ڕیّی گومڕاییو هەقی لە بەتالّ جیا کردەوەو خەلّکی لە سەر لیّشیّواویەوە بەرەو بیّداریو وشیاری برد. بەهۆی ئەو هەموو بەلّگەو نیشانە ڕوونو ئاشکرانەوە

کە بۆی باس کردونو ڕوونی کردۆتەوە بۆیان. پاشان دەفەرمووێت: ﴿إِنَّ الَّذِينَ كَفَرُوا بِآيَاتِ اللَّهِ لَهُمْ عَذَابٌ شَدِيدٌ﴾ ئەوانەی کە لە نیشانەکانی خودا حاشایان کرد، جەزرەبەیان زۆر بە ژانە لە ڕۆژی قیامەتدا. ﴿وَاللَّهُ عَزِيزٌ ذُو انتِقَامٍ﴾ خودا خاوەن دەستەلاتی تۆڵەسێنە. واتە: دەربارەی ئەوانەی بڕوایان بە نیشانەکانی نیەو دژایەتیو سەرپێچی پێغەمبەرە مەزنەکانی دەکەن.

﴿إِنَّ اللَّهَ لَا يَخْفَىٰ عَلَيْهِ شَيْءٌ فِي الْأَرْضِ وَلَا فِي السَّمَاءِ ﴿٥﴾ هُوَ الَّذِي يُصَوِّرُكُمْ فِي الْأَرْحَامِ كَيْفَ يَشَاءُ ۚ لَا إِلَٰهَ إِلَّا هُوَ الْعَزِيزُ الْحَكِيمُ ﴿٦﴾﴾

خودای مەزن دەفەرمووێت: ﴿إِنَّ اللَّهَ لَا يَخْفَىٰ عَلَيْهِ شَيْءٌ فِي الْأَرْضِ وَلَا فِي السَّمَاءِ﴾ هەر شتێك لە زەمین یان لە ئاسمان بێ، لە خودا شاراوە نیە. خودای مەزن دەفەرمووێت کە ئاگاداری نهێنیەکانی ئاسمانو زەمینە، هیچ شتێکی لێ ون نابێ تێیاندا ﴿هُوَ الَّذِي يُصَوِّرُكُمْ فِي الْأَرْحَامِ كَيْفَ يَشَاءُ﴾ هەر ئەوە هەرچۆنێ بیەوێت (هەر لە منداڵدانی دایکانتاندا) شێوەتان بۆ دیاری دەکات. واتە: لە سکی دایکاندا دروستتان دەکات بە هەر شێوەیەك خۆی بیەوێت بە نێر یان بە مێو جوانیو ناشیرینیو بەختەوەرو بەدبەخت. ﴿لَا إِلَٰهَ إِلَّا هُوَ الْعَزِيزُ الْحَكِيمُ﴾ جگە لەو هیچ کەسێ بۆ پەرستن ناشێ. هەر خۆشی دەستەڵاتداری لەکارزانە. واتە: هەر خۆی وەدیهێنەرەو هەر خۆشی شایەنی پەرستنەو تاكو تەنیایەو شەریکی نیە، دەستەڵاتی بێپایان هەر هی ئەوەو لەکارزانی هەر لەو دەوەشێتەوە. ئەم ئایەتە نیشانەو ئاگاداری تێدایە کە عیسای کوڕی مەریەم بەندەیەکی دروس کراوە، وەك چۆن خودا دروسکراوەکانی تری مرۆڤی وەدیهێناوە. بێگومان خودا شێوەی دیاری کردوە لە سکی دایکیا. چۆنیشی ویستووە وا دروستی کردوە، کەوایە چۆن دەبێ پەرستراو بێ وەك گاورەکان دەڵێن بەر نەفرینی خودا کەون. لەناو سکا هەڵسوڕاوەو لە حاڵێکەوە چووە بۆ حاڵێکی تر؟ وەك خودای مەزن دەفەرمووێت: ﴿يَخْلُقُكُمْ فِي بُطُونِ أُمَّهَاتِكُمْ خَلْقًا مِّن بَعْدِ خَلْقٍ فِي ظُلُمَاتٍ ثَلَاثٍ﴾[1] ئێوە ئاوا دروس دەکات، لە زکی دایکانتاندا (جار لە دوای جار) لە سێ قۆناخی تاریکیدا، هەڵگێڕو وەرگێڕتان پێدەکات.

﴿هُوَ الَّذِي أَنزَلَ عَلَيْكَ الْكِتَابَ مِنْهُ آيَاتٌ مُّحْكَمَاتٌ هُنَّ أُمُّ الْكِتَابِ وَأُخَرُ مُتَشَابِهَاتٌ ۖ فَأَمَّا الَّذِينَ فِي قُلُوبِهِمْ زَيْغٌ فَيَتَّبِعُونَ مَا تَشَابَهَ مِنْهُ ابْتِغَاءَ الْفِتْنَةِ وَابْتِغَاءَ تَأْوِيلِهِ ۗ وَمَا يَعْلَمُ تَأْوِيلَهُ إِلَّا اللَّهُ ۗ وَالرَّاسِخُونَ فِي الْعِلْمِ يَقُولُونَ آمَنَّا

---

[1] الزمر (٦).

بِهِۦ كُلٌّ مِّنْ عِندِ رَبِّنَا وَمَا يَذَّكَّرُ إِلَّآ أُوْلُواْ ٱلْأَلْبَٰبِ ﴿٧﴾ رَبَّنَا لَا تُزِغْ قُلُوبَنَا بَعْدَ إِذْ هَدَيْتَنَا وَهَبْ لَنَا مِن لَّدُنكَ رَحْمَةً إِنَّكَ أَنتَ ٱلْوَهَّابُ ﴿٨﴾ رَبَّنَآ إِنَّكَ جَامِعُ ٱلنَّاسِ لِيَوْمٍ لَّا رَيْبَ فِيهِ إِنَّ ٱللَّهَ لَا يُخْلِفُ ٱلْمِيعَادَ ﴿٩﴾﴾

**باسی ئەو ئایەتانەی لەیەك دەچن و ئەوانەیش ڕۆشن و بتەون**

خودای مەزن دەفەرمووێت: لەناو قورئاندا چەندین ئایەتی ڕۆشن‌و بتەو هەیە کە ماکن بۆ ئەم کتێبە، واتە: زۆر ڕۆشن‌و نیشانەکانی دیارو ئاشکران، هیچ کەسێ گومانی تێیاندا نیە، هەندێ ئایەتی تریش هەن گومان لە نیشانەکانیاندا هەیەو ڕۆشن نین لە زۆرێ لە خەڵکی یان لەلای هەندێکیان، هەرکەسێ وازی لەو ئایەتانە هێناو گەڕایەوە بۆ لای ئایەتە ڕۆشن‌و بتەوەکان‌و کاری پێ کردن، ئەو کەسە شارەزای ڕێی ڕاست بووە. هەرکەسیش بە پێچەوانەوە کاری کرد ئەوە ڕێگای لێ تێکچووە. هەر بۆیە خودای مەزن دەفەرمووێت: ﴿هُوَ ٱلَّذِىٓ أَنزَلَ عَلَيْكَ ٱلْكِتَٰبَ مِنْهُ ءَايَٰتٌ مُّحْكَمَٰتٌ هُنَّ أُمُّ ٱلْكِتَٰبِ وَأُخَرُ مُتَشَٰبِهَٰتٌ﴾ هەر ئەویشە ئەم کتێبەی بۆ تۆ بە خەڵات ناردووە، کە لەوێدا چەندین ئایەتی ڕۆشن‌و بتەو هەن کە ماکن بۆ ئەم کتێبە. واتە: بنەڕەتی ئەم قورئانەن لە کاتی گوماندا بۆی دەگەڕێنەوە. چەندین ئایەتی تریش هەن ڕۆشن نین، بەڵام ڕێکدەکەون لەگەڵ ئایەتە ڕۆشنەکاندا، جاری واش هەیە مانای شتی تریش هەڵدەگرێ لە وتەو دەقدا، بەڵام ئەو مەبەستە ناگەیەنێ، ئایەتە ڕۆشن‌و بتەوەکان (المحكمات) ناسیخی هەیەو حەڵاڵ‌و حەرام‌و بڕیارو سنوور فەرزو فەرمانەو فەرمانیان پێدەکرێ. بەڵام ئەو ئایەتانەی کە ڕۆشن نین‌و لە یەك دەچن (المتشابهات) کە نەسخ بونەتەوەو پێش‌و پاشی کەوتون‌و بەسەرهات‌و بەش بەشن، بڕوایان پێدەکرێ بەڵام کاریان پێناکرێ. موحەممەدی کوڕی یەسار (ڕەحمەتی خوای لێ بێ) وتی: ﴿مِنْهُ ءَايَٰتٌ مُّحْكَمَٰتٌ﴾ کە نیشانەکانی پەروەردگارن‌و دەبێتە پارێزەرو پاك ڕاگرتنی عەبدەکان‌و ناکۆکی ناهێڵێت‌و پڕوپوچ لەناو دەبات‌و هیچ گۆڕانکاری بەسەردا نایەت‌و وەك خۆیان دەمێننەوە. دەڵێ: (المتشابهات)یش یانی ئەوانەی ڕۆشن نین لە حەقیقەتدا، ئەم ئایەتانەن کەمانەکەیان گۆڕانکاریان تیادەکرێ‌و تەفسیر دەکرێن‌و لێك ئەدرێنەوە، ئەم ئایەتانە خودای مەزن عەبدەکانی تیا تاقی دەکاتەوە وەك چۆن لە حەڵاڵ‌و حەرامدا تاقی کردونەتەوە، نەکەن بەرەو پڕوپوچ بڕۆن، لە هەق لانەدەن. هەر بۆیە خودای گەورە دەفەرمووێت: ﴿فَأَمَّا ٱلَّذِينَ فِى قُلُوبِهِمْ زَيْغٌ﴾ ئەو کەسانەی لە دڵیاندا چەوتی‌و لاری‌و دەغەزیان هەیە. حەز دەکەن لە هەق لادەن‌و بەرەو پڕوپوچ بڕۆن ﴿فَيَتَّبِعُونَ مَا تَشَٰبَهَ مِنْهُ﴾ دوای ئەم ئایەتانە دەکەون کە لە قورئاندا هاوشێوەن. واتە: ئەو ئایەتە هاوشێوانە وەردەگرن کە حەز دەکەن بە ئارەزووی خۆیان بیگۆڕن بۆ ئەو مەبەستە خراپەی خۆیان دەیانەوێت. لەبەر ئەوە واتاکەی هەڵدەگرێ بیگۆڕن. بەڵام ئایەتی ڕۆشن‌و بتەو (المحكم) ئەوانە هیچ

بەشێکیان تێدا نیە، چونکە سەریان دەکوتێتەوەو دەبێتە بەڵگە بەسەریانەوە. هەر بۆیە خودا دەفەرمووێت: ﴿ٱبۡتِغَآءَ ٱلۡفِتۡنَةِ﴾ هەر ئەوانە دەیانەوێ کە خەڵکی پێ هەڵخەڵەتێ‌و شوێنکەوتوەکانی خۆیانی پێ گومڕا بکەن، وایان تێ بگەیەنن کە بەڵگە بۆ کارە خراپەکانیان بە قورئان دێننەوە. ئەوە بەڵگەیە لەسەر خۆیان، نەك بۆ خۆیان. وەك ئەوە وایە کە بەڵگە بێننەوە کە قورئان دانی پێدا ناوە کە عیسا گیانی (ڕوحی) خوداو کەلیمەی خودایە فرێدرایە ناو سکی مەریەم. بەڵام وازیان هێناوە لەم ئایەتانە کە خودای مەزن دەفەرمووێت: ﴿إِنۡ هُوَ إِلَّا عَبۡدٌ أَنۡعَمۡنَا عَلَيۡهِ﴾[١] ئەو هیچ نەبوو عەبدێك نەبێ، ئێمە چاکەمان لەگەڵ کرد. دەفەرمووێت: ﴿إِنَّ مَثَلَ عِيسَىٰ عِندَ ٱللَّهِ كَمَثَلِ ءَادَمَۖ خَلَقَهُۥ مِن تُرَابٖ ثُمَّ قَالَ لَهُۥ كُن فَيَكُونُ﴾[٢] نموونەی عیساش (لە لای خودا) لە چەشنی نموونەی ئادەمە، هەر لە گڵ دروستی کرد، پاشان پێی وت: ببە بە ئادەم، ئەویش بوو. چەندین ئایەتی ڕۆشن‌و بتەوی تر هاتووە کە عیسایش دروستکراوێکە لە دروستکراوەکانی خوداو بەندەو پێغەمبەرێکە لەپێغەمبەرەکانی خودا. وە دەفەرمووێت: ﴿وَٱبۡتِغَآءَ تَأۡوِيلِهِۦ﴾ هەرچۆنێك دەیانەوێ مانایان لێك ئەدەنەوە. واتە: دەیگۆڕن. ئیمامی ئەحمەد لە عائیشەوە (ڕەزای خوای لێ بێ) ڕیوایەتی کردوە وتی: پێغەمبەری خودا (ﷺ) ئەم ئایەتەی خوێندەوە ﴿هُوَ ٱلَّذِيٓ أَنزَلَ عَلَيۡكَ ٱلۡكِتَٰبَ مِنۡهُ ءَايَٰتٞ مُّحۡكَمَٰتٌ هُنَّ أُمُّ ٱلۡكِتَٰبِ﴾ هەتا دەگاتە ﴿أُوْلُواْ ٱلۡأَلۡبَٰبِ﴾ عائیشە وتی: پێغەمبەری خودا (ﷺ) فەرموویەتی: (ئەگەر ئەوانەتان بینی کە مشتومڕیان لەسەر ئەو ئایەتانە دەکرد کە مانای جۆراو جۆر هەڵدەگرن خودا مەبەستی ئەوانەیە، خۆتانی لێبپارێزن)[٣] بوخاریش ئەم فەرموودەیەی ڕیوایەت کردووە لە تەفسیری ئەم ئایەتەدا، موسلیمیش لە کتێبی قەدەرا ڕیوایەتی کردوە لە سەحەیحەکەیدا ئەبوداوودیش لە سونەنەکەیدا، هەرسێکیان هەر لە عائیشەوە (ڕەزای خوای لێ بێ) کە وتی: پێغەمبەری خودا (ﷺ) ئەم ئایەتەی خوێندەوە: ﴿هُوَ ٱلَّذِيٓ أَنزَلَ عَلَيۡكَ ٱلۡكِتَٰبَ مِنۡهُ ءَايَٰتٞ مُّحۡكَمَٰتٌ﴾ هەتا دەگاتە ﴿وَمَا يَذَّكَّرُ إِلَّآ أُوْلُواْ ٱلۡأَلۡبَٰبِ﴾ وتی: پێغەمبەری خودا (ﷺ) فەرمووی: (ئەگەر ئەوانەتان بینی کە دوای ئەم ئایەتانە

---

[١] الزخرف (٥٩).

[٢] آل عمران (٥٩).

[٣] أحمد (٦/٤٨)، سەحیحە.

دەکەوتن کە مانای جۆراو جۆر هەڵدەگرن، ئەوانە ئەو کەسانەن کە خودای مەزن ناوی بردوون خۆتانیان لێ بپارێزن)[1] ئەمە وتەی بوخاریە.

### (المتشابهات) جگە لە خودا هیچ کەسێ مانای ئەم ئایەتانە نازانێ کە ماناکانیان ڕۆشن نیە

خودای مەزن دەفەرمووێت: ﴿وَمَا يَعْلَمُ تَأْوِيلَهُۥٓ إِلَّا ٱللَّهُ﴾ کە جگە لە خودا هیچ ماناکەیان نازانێ قورئان خوێنەکان ناکۆکن لەسەر وەستان لێرەدا. هەندێ دەڵێن: دەبێ وەستان لەسەر وتەی (الله) بێ. وەك لە پێشەوە ڕیوایەت کراوە لە ئیبنوعەبباسەوە کە وتی: تەفسیر چوار جۆرە. تەفسیرێك هیچ کەس بڕو بیانووی نیە لە تێگەیشتنیا. تەفسیرێك کە عەرەبەکان دەیزانن لە زمانی خۆیاندا، تەفسیرێك ئەوانە دەیزانن کە زۆر زانان. تەفسیرێکیش جگە لە خودا هیچ کەس نایزانێ.[2] ئەم قسەیە ڕیوایەت کراوە لە عائیشەو عورەوەی کوڕی ئەبوشەعساءو (الشعثاء) ئەبونەهیكو کەسانی تریشەوە. هەندێکیش لەسەر ﴿وَٱلرَّٰسِخُونَ فِى ٱلْعِلْمِ﴾ ئەوانەی کە زۆر زانان. ڕاوەستاون. زۆر لە زانایانی تەفسیرو ئوسولیەکان (اهل الاصول) شوێنی پێیان هەڵگرتوونو دەڵێن: قسە بە شتێ کە ماناکەی نەزانرێ دورە (واتە: ماناکەی دیارە) ڕیوایەتی کراوە لە ئیبنوئەبی نەجیحەوە لە موجاهیدەوە لە ئیبنوعەبباسەوە کە وتی: من یەکێکم لەو کەسانەی زۆر زانانو ماناکەیش دەزانن[3].لەم فەرموودەیەدا هاتووە کە پێغەمبەری خودا (ﷺ) دوعای کرد بۆ ئیبنوعەبباسو فەرمووی: (ئەی خودایە شارەزای بکە لە ئایناو فێری مانای (التأويل)ی بکە).[4] تەئویل: دوو مانای هەیە لە قورئاندا: یەکەم: تەئویل بە مانای حەقیقەتی شتێو ئەوەی فەرمانەکەی دەگەڕێتەوە بۆ لای. لەوانە کە خودای گەورە دەفەرمووێت: ﴿وَقَالَ يَٰٓأَبَتِ هَٰذَا تَأْوِيلُ رُءْيَٰىَ مِن قَبْلُ﴾[5] ئەی باوکی خۆشەویستم ئەمە لێکدانەوەی خەوەکەی پێشوومە کە (بینیم). دەفەرمووێت: ﴿هَلْ يَنظُرُونَ إِلَّا تَأْوِيلَهُۥ يَوْمَ يَأْتِى تَأْوِيلُهُۥ﴾[6] ئایا ئەمان بۆ ئەو ڕۆژە دەڕوانن کە هەرچی لەم کتێبەدایە، بە چاوی خۆیان ببینن. ڕۆژێ دێت کە ئاکام ڕوون دەبێتەوەو بەدی دێت. واتە: ڕاستی ڕۆژی قیامەت دێت کە خودای مەزن فەرموویەتی. ئەگەر مەبەست بە تەئویل ئەمە بێ دەبێ وەستان

---

[1] فتح الباري (٥٧/٨)، مسلم (٢٠٥٣/٤)، أبوداود (٦/٥).

[2] الطبري (٥٧/١).

[3] الطبري (٢٠٣/٦).

[4] فتح الباري (٢٠٥/١).

[5] يوسف (١٠٠).

[6] الاعراف (٥٣).

لەسەر وتەی (الله) بێت. چونکە حەقیقەتی شتەکان و بناغەیان هیچ کەسێ نایزانێ تەنیا خودا نەبێ و هەر ئەو دەیزانێ، لێرەدا ﴿وَٱلرَّٰسِخُونَ فِي ٱلۡعِلۡمِ﴾ (مبتەدایە)و ﴿يَقُولُونَ ءَامَنَّا بِهِۦ﴾ خەبەرەکەیەتی. بەڵام ئەگەر بە تەئویل مانایەکی تر بێت، کە بریتیە لە تەفسیر کردن و ڕوون و ئاشکرا کردنی شتێك وەك خودای مەزن دەفەرمووێت: ﴿نَبِّئۡنَا بِتَأۡوِيلِهِۦٓ﴾[1] خەوەکەمان بۆ لێکدەرەوە واتە: هەواڵمان بدەرێ بە تەفسیرەکەی، ئەگەر مەبەست پێی ئەم مانایە بێ، وەستانەکە لەسەر ﴿وَٱلرَّٰسِخُونَ فِي ٱلۡعِلۡمِ﴾ ئەوانەی کە زۆر زانان، چونکە ئەوانە دەزانن و تێدەگەن کە چۆن ڕووی قسەیان تێکراوەو بایەخیان پێدراوە.

پاشان خودای مەزن دەربارەیان دەفەرمووێت: ﴿يَقُولُونَ ءَامَنَّا بِهِۦ﴾ ئەڵێن: بڕوامان پێی هەیە. واتە: بڕوامان بەوە هەیە کە ئەو ئایەتانە مانای جۆراو جۆر هەڵدەگرن ﴿كُلّٞ مِّنۡ عِندِ رَبِّنَا﴾ ئەمانە هەموو لە لایەن خوداوەیە واتە: ئایەتی ڕۆشن و بتەو ئەو ئایەتانەشی ماناکانی ڕۆشن نیەو هەموو لە لای خودای گەورەوە هاتۆتە خوار هەق و ڕاستن، هەر ئایەتێکیان پشتگیری ئەوی تریان دەکات و شایەتی بۆ ئەدا، هیچ شتێ لە لای خودا جیاواز و دژی یەکتر نیە. وەك لە ئایەتێکی تردا دەفەرمووێت: ﴿أَفَلَا يَتَدَبَّرُونَ ٱلۡقُرۡءَانَۚ وَلَوۡ كَانَ مِنۡ عِندِ غَيۡرِ ٱللَّهِ لَوَجَدُواْ فِيهِ ٱخۡتِلَٰفٗا كَثِيرٗا﴾[2] ئاخۆ ئەوانە لە قورئان ورد نابنەوە (سەرنجی ڕاناکێشاون)؟ ئەگەر قورئان کاری کەسێکی تر بوایە جگە لە خودا. دیارە مەبەستی ناڕێك و دژ بەیەکتریان زۆر تیا پەیدا دەکرد. هەر بۆیە خودای مەزن دەفەرمووێت: ﴿وَمَا يَذَّكَّرُ إِلَّآ أُوْلُواْ ٱلۡأَلۡبَٰبِ﴾ جگە لەو دڵ وشیارانە بە وردی بیر ناکەنەوە. واتە: بێگومان ئەو کەسانەی خاوەنی دڵی وشیارن و بە وشیاری بیر لە ماناکانی دەکەنەوە بەو شێوەی کە ڕاست و ڕەوایە، هەر ئەوانە لێی تێدەگەن و دەزانن بە چاکی مانای بکەن. ئیبنومونزیر لە تەفسیرەکەیدا لە نافیعی کوڕی یەزیدەوە ڕیوایەتی کردوە وتی: دەڵێن: ﴿وَٱلرَّٰسِخُونَ فِي ٱلۡعِلۡمِ﴾ ئەوانەی زۆر زانان، زۆر خۆیان بە کەم دەزانن بەرانبەر بە خوداو ملکەچن بۆ خوداو هەمیشە بە شوێن ڕەزامەندی ئەودا دەگەڕێن و بە ئارەزوی خۆیان دەم ناکوتن و لە خۆیانەوە قسە ناکەن بەرانبەر بەو کەسەی کە بە ڕاسەریانەوەیەو کەسی تریش جگە لە خۆیان بە سووك سەیر ناکەن. پاشان خودای مەزن دەربارەیان دەفەرمووێت کە لە پەروەردگاریان دەپاڕێنەوەو دەڵێن: ﴿رَبَّنَا لَا تُزِغۡ قُلُوبَنَا بَعۡدَ إِذۡ هَدَيۡتَنَا﴾ ئەی پەروەردگاری هەموومان لە پاش ئەوەی

---

[1] یوسف (٣٦).

[2] النساء (٨٢).

ڕێگەی ڕاستت نیشان داوین. واتە: دوای ئەوە کە دڵەکانمانت لەسەر ڕاستەڕێ ڕاوەستاندوە لای مەدە، وەك ئەوانەمان لێ مەکە کە لە دڵیاندا دەغەز هەیەو لایان داوەو شوێنی ئەو ئایەتانە دەکەون کە ڕۆشن نین لەناو قورئانداو مانای جۆراو جۆر هەڵدەگرن، بەڵکو ڕاوەستاومان کە لەسەر ڕاستە ڕێ خۆت‌و ئاینە ڕاست‌و ڕێکەکەت ﴿وَهَبْ لَنَا مِن لَّدُنكَ رَحْمَةً﴾ وەبەر بەزەیی خۆتمان بخەو دڵەکانمان بە بەزەیی خۆت ڕاوەستاو کەو پێکەوە کۆمان کەرەوەو بڕوامان زیاتر بەهێز بکە پێی. ﴿إِنَّكَ أَنتَ الْوَهَّابُ﴾ بەخشندەی هەرە مەزن تۆی. ئیبنوئەبی حاتەم ڕیوایەتی کردوە لە ئیبنوجەریرەوە: لە ئوممو سەلەمەوە کە پێغەمبەری خودا(ﷺ) ئەیفەرموو: (ئەی ئەو کەسەی دڵەکان ئاژوگوێز پێدەکەی دڵم ڕاوەستاو کە لەسەرئاینەکەت) پاشان ئەم ئایەتەی خوێند: ﴿رَبَّنَا لَا تُزِغْ قُلُوبَنَا بَعْدَ إِذْ هَدَيْتَنَا وَهَبْ لَنَا مِن لَّدُنكَ رَحْمَةً إِنَّكَ أَنتَ الْوَهَّابُ﴾[1] پاشان خودای گەورە دەفەرموێت: ﴿رَبَّنَا إِنَّكَ جَامِعُ النَّاسِ لِيَوْمٍ لَّا رَيْبَ فِيهِ إِنَّ اللَّهَ لَا يُخْلِفُ الْمِيعَادَ﴾ پەروەردگارمان هەر تۆی مەردم لەو ڕۆژەدا (کە گومانی تێدا نیە) لە یەکتر کۆ دەکەیتەوەو بێگومان خودا پەیمان ناشکێنێ. واتە: بڕواداران دەڵێن: لە پاڕانەوەکەیاندا، ئەی پەروەردگارمان بەو زووانە هەموو خەڵکی لە یەکتر کۆ دەکەیتەوە لە ڕۆژی قیامەتدا، کێشەکانیان بۆ جیا دەکەیتەوە لە یەکتریو فەرمانی خۆت ئەدەیت لە نێوانیاندا لەسەر ئەو ناکۆکیانەی کە بوویانە لە دنیادا، هەر کەسەو بە پێی ئاکاری خۆی پاداشتی ئەدەیتەوە، چاکە بە چاکەو خراپەیش بە تۆڵە لێسەندنەوە.

﴿إِنَّ الَّذِينَ كَفَرُوا لَن تُغْنِيَ عَنْهُمْ أَمْوَالُهُمْ وَلَا أَوْلَادُهُم مِّنَ اللَّهِ شَيْئًا وَأُولَٰئِكَ هُمْ وَقُودُ النَّارِ (١٠) كَدَأْبِ آلِ فِرْعَوْنَ وَالَّذِينَ مِن قَبْلِهِمْ كَذَّبُوا بِآيَاتِنَا فَأَخَذَهُمُ اللَّهُ بِذُنُوبِهِمْ وَاللَّهُ شَدِيدُ الْعِقَابِ (١١)﴾

**لە ڕۆژی قیامەتدا ماڵ‌و سامان‌و منداڵ سوودی نیە**

خودای مەزن باسی خوانەناسان دەکات کە سووتەمەنی ئاگرن‌و دەفەرموێت: ﴿يَوْمَ لَا يَنفَعُ الظَّالِمِينَ مَعْذِرَتُهُمْ وَلَهُمُ اللَّعْنَةُ وَلَهُمْ سُوءُ الدَّارِ﴾[2] لەو ڕۆژەدا کە ناهەقیکاران پاکانەیان هیچ سوودێکیان پێناگەیەنێ‌و نەفرینیان لێ کراوەو ناڵەبارترین شوێنیان هەیە. واتە: ئەو ماڵ سامان‌و منداڵانەیان لە لای خودا هیچ سودێکیان پێ ناگەیەنێت‌و لە سزای توندی خودا ڕزگاریان ناکات. وەك خودای مەزن دەفەرموێت: ﴿فَلَا تُعْجِبْكَ أَمْوَالُهُمْ وَلَا أَوْلَادُهُمْ إِنَّمَا يُرِيدُ اللَّهُ لِيُعَذِّبَهُم بِهَا فِي الْحَيَاةِ

---

[1] إبن أبي حاتم (٢/٨٤)، الطبري (٦/٢١٣).

[2] غافر (٥٢).

ٱلدُّنۡيَا وَتَزۡهَقَ أَنفُسُهُمۡ وَهُمۡ كَٰفِرُونَ ۝٥٥ وَيَحۡلِفُونَ بِٱللَّهِ إِنَّهُمۡ لَمِنكُمۡ وَمَا هُم مِّنكُمۡ وَلَٰكِنَّهُمۡ قَوۡمٞ يَفۡرَقُونَ﴾[1] سەیرت نەیە لە دارایی‌و منداڵانێ کە هەیانە، خودا دەیەوێ لە دنیادا بەمانە ئازاریان داو هەر بە خوانەناسی بمرن. وە دەفەرموویٚت: ﴿لَا يَغُرَّنَّكَ تَقَلُّبُ ٱلَّذِينَ كَفَرُواْ فِي ٱلۡبِلَٰدِ ۝١٩٦ مَتَٰعٞ قَلِيلٞ ثُمَّ مَأۡوَىٰهُمۡ جَهَنَّمُۚ وَبِئۡسَ ٱلۡمِهَادُ﴾[2] هاتو چوون‌و گرو فڕی خوانەناسان لە وڵاتان، نەچێ هەڵت خەڵەتێنێ. ڕابواردنێکی کەمەو پاشان شوێنیان دۆزەخەو جێیان زۆر خراپە. وەك خودای گەورە لێرەیشدا دەفەرموویٚت: ﴿إِنَّ ٱلَّذِينَ كَفَرُواْ لَن تُغۡنِيَ عَنۡهُمۡ أَمۡوَٰلُهُمۡ وَلَآ أَوۡلَٰدُهُم مِّنَ ٱللَّهِ شَيۡـٔٗاۖ وَأُوْلَٰٓئِكَ هُمۡ وَقُودُ ٱلنَّارِ﴾ ئەو ڕۆژەی ماڵ‌و منداڵ، بە هانای ئەوانەوە نایە کە خودایان نەناسیوە، ئەوانە دەبنە سووتەمەنی ئاگر. واتە: ئەوانەی بڕوایان بە خوداو پێغەمبەرەکەی (ﷺ) نیەو دژایەتی کتێبەکەی دەکەن‌و سوودیان لەو نیگایە وەرنەگرتووە کە هاتووە بۆ پێغەمبەرەکانی، شوێنی ئەوانە ناو ئاگرەو بەوان ئەو ئاگرە هەڵدەگیرسێ. وەك ئەم ئایەتەش کە خودای مەزن دەفەرموویٚت: ﴿إِنَّكُمۡ وَمَا تَعۡبُدُونَ مِن دُونِ ٱللَّهِ حَصَبُ جَهَنَّمَ﴾[3] بەڕاستی ئێوەو ئەوانەش دەیانپەرستن جگە لە خودا (دەبنە) سووتەمەنی جەهەنم. وە دەفەرموویٚت: ﴿كَدَأۡبِ ءَالِ فِرۡعَوۡنَ وَٱلَّذِينَ مِن قَبۡلِهِمۡۚ كَذَّبُواْ بِـَٔايَٰتِنَا فَأَخَذَهُمُ ٱللَّهُ بِذُنُوبِهِمۡ﴾ وەك دارو دەستەی فیرعەون‌و ئەوانەی پێش لەوانیش بوون. کە نیشانەی ئێمەیان بە درۆ زانی، خودا لە تاوانی سزای خۆیان گرتنی. زەححاك وتی: لە ئیبنوعەبباسەوە، وتی: ﴿كَدَأۡبِ ءَالِ فِرۡعَوۡنَ﴾ وەك ئاکاری دارو دەستەی فیرعەون[4] هەر وایش ڕیوایەت کراوە لە عیکرمەو موجاهیدو ئەبومالیك‌و زەححاك‌و کەسانی تریشەوە. هەندێ دەڵێن: وەك قات‌و قڕیەکەی دارو دەستەی فیرعەون (کە خودا هێنای بەسەریاندا) یان وەك ئاکاری دارو دەستەی فیرعەون یان وەك وێنەی دارو دەستەی فیرعەون.[5] وتەکان لە یەکەوە نزیکن. (الدأب) واتە: کردارو ژیان‌و ماڵ‌و بڕیارو باوی دارو دەستەی فیرعەون. وەك دەڵێن: بەردەوام ئەمە ڕەوشتی من‌و ڕەوشتی تۆیە مانای ئایەتەکە ئەمەیە کە خوانەناسان ماڵ‌و منداڵ بێ نیازیان ناکات لە ڕۆژی قیامەتدا بەڵکو لەناو دەچن‌و سزایش ئەدرێن وەك

---

[1] التوبة (٥٥).

[2] آل عمران (١٩٦-١٩٧).

[3] الانبياء (٩٨).

[4] الطبري (٦/٢٢٤).

[5] إبن أبي حاتم (٢/٩٢).

چۆن دارو دەستەی فیرعەون لەناو چوون‌و سزا دران‌و ئەوانەیش لە پێش دارو دەستەی فیرعەونیشا بوون کە بڕوایان بەو نیشانانە نەهێنا کە پێغەمبەرەکانیان بۆیان هێنان. ﴿وَاللَّهُ شَدِيدُ الْعِقَابِ﴾ خودا لە تۆڵە سەندندا زۆر توندو تیژە. واتە: زۆر زوو خوانەناسان دەگرێ‌و سزای زۆر بە ژانە. هیچ کەس ناتوانێ بەری لێ بگرێ، هیچیشی لە دەست دەرناچێ، بەڵکو خودا هەرچی بوێ دەیکات‌و بەسەر گشت شتێکدا زاڵە، هەموو شتێ ملکەچیەتی، هیچ خودایەك‌و هیچ پەروەردگارێك جگە لەوبوونی نیە.

﴿قُل لِّلَّذِينَ كَفَرُوا سَتُغْلَبُونَ وَتُحْشَرُونَ إِلَىٰ جَهَنَّمَ ۚ وَبِئْسَ الْمِهَادُ (١٢) قَدْ كَانَ لَكُمْ آيَةٌ فِي فِئَتَيْنِ الْتَقَتَا ۖ فِئَةٌ تُقَاتِلُ فِي سَبِيلِ اللَّهِ وَأُخْرَىٰ كَافِرَةٌ يَرَوْنَهُم مِّثْلَيْهِمْ رَأْيَ الْعَيْنِ ۚ وَاللَّهُ يُؤَيِّدُ بِنَصْرِهِ مَن يَشَاءُ ۗ إِنَّ فِي ذَٰلِكَ لَعِبْرَةً لِّأُولِي الْأَبْصَارِ (١٣)﴾

**هەڕەشە کردن لە جوولەکەکان کە بەو زوانە زێر دەکەون، هەڵنانیان بۆ پەند وەرگرتن لە ڕۆژی بەدر**

﴿قُل لِّلَّذِينَ كَفَرُوا سَتُغْلَبُونَ وَتُحْشَرُونَ إِلَىٰ جَهَنَّمَ ۚ وَبِئْسَ الْمِهَادُ﴾ (ئەی موحەممەد (ﷺ)) بەو خوانەناسانە بڵێ: بەو زوانە ژێر دەکەون‌و هەر ئەوەندەت زانی ڕاپێچ کران بۆ ناو دۆزەخ کە چ شوێنێکی خراپە. واتە: لە دنیادا ژێر دەکەون‌و لە ڕۆژی قیامەتیشا دەچنە ناو جەهەنم. موحەممەدی کوڕی ئیسحاقی کوڕی یەسار وتی لە عاسمی کوڕی عومەری کوڕی قەتادەوە کە پێغەمبەری خودا (ﷺ) فەرمووی: ئەوەی تووشی خەڵکی بەدر هات کە هات، گەڕایەوە بۆ مەدینە، جوولەکەکانی کۆ کردەوە لە بازاڕی قەینوقاع‌و فەرمووی: (ئەی کۆمەڵی جوولەکە موسوڵمان بن پێش ئەوەی وەك قورەیشیەکانتان بەسەر بێت کە بەسەریان هات؟ ئەوانیش وتیان: ئەی موحەممەد (ﷺ) لە خۆت بایی مەبە کە چەند کەسێکی بێ ئەزموونی قورەیشت کوشتون کە نازانن جەنگ چیە، سوێند بە خوا ئەگەر تۆ شەڕمان پێ بفرۆشی دەزانی کە ئێمە چۆن کەسێکین، تۆ هەرگیز تووشی کەسی وەك ئێمە نابیت؟ خودای مەزن ئەم ئایەتەی ناردە خوارەوە ﴿قُل لِّلَّذِينَ كَفَرُوا سَتُغْلَبُونَ وَتُحْشَرُونَ إِلَىٰ جَهَنَّمَ ۚ وَبِئْسَ الْمِهَادُ﴾ هەتا دەگاتە: ﴿إِنَّ فِي ذَٰلِكَ لَعِبْرَةً لِّأُولِي الْأَبْصَارِ﴾ هەر بۆیە خودای گەورە دەفەرمووێت: ﴿قَدْ كَانَ لَكُمْ آيَةٌ﴾ ئەمە بۆ ئێوە دەرسێك بووە، ئەی ئەو جوولەکانەی ئەو قسانە دەکەن. واتە: خودا ئاینەکەی خۆی سەردەخات‌و یارمەتی پێغەمبەرەکەی (ﷺ) ئەدات‌و وتەی (لا إله إلا الله) بەرز دەکاتەوەو فەرمانی خۆی بەڕێ دەکات. ﴿فِي فِئَتَيْنِ الْتَقَتَا ۖ فِئَةٌ تُقَاتِلُ فِي سَبِيلِ اللَّهِ وَأُخْرَىٰ كَافِرَةٌ يَرَوْنَهُم مِّثْلَيْهِمْ رَأْيَ الْعَيْنِ﴾ دوو دەستە لە خۆتان بە گژ یەکدا چوون،

دەستەیەکیان شەڕیان بۆ خودا کردو دەستەکەی تر لە دژی خودا شەڕیان دەکرد. زەق دەیاندی کە خوانەناسەکان دوو ئەوەندەی ئەوانن، خودا ئەوەی کردە هۆی سەرکەوتنی ئیسلام بەسەر خوانەناساندا. هەندێ دەڵێن: مانای ئەم ئایەتە کە خودای مەزن دەفەرمووێت: ﴿يَرَوْنَهُم مِّثْلَيْهِمْ رَأْيَ ٱلْعَيْنِ﴾ واتە: دەستەی خاوەن باوەڕان وایان دی کە دەستەی خوانەناسان دوو ئەوەندەی ئەوانن لە ژمارەدا، لەگەڵ ئەوەیشدا خودا سەری خستن. عەبدوڵلای کوڕی مەسعود وتی: سەیری بت پەرستەکانمان کرد دوو ئەوەندەی ئێمە بوون. دیسان سەیرمان کرد وامان نەدەزانی یەك کەسیان لە ئێمە زیاتر نیە. وەك ئەوەی کە خودای مەزن دەفەرمووێت: ﴿وَإِذْ يُرِيكُمُوهُمْ إِذِ ٱلْتَقَيْتُمْ فِىٓ أَعْيُنِكُمْ﴾[1] ئەوساش کە تووشی یەك هاتن، لەبەرچاوتان ئەوانی کەمتر نیشانداو ئێوەشی کەم هێنایە بەر چاوی ئەوان.[2] ئەبو ئیسحاق وتی لە ئەبوعوبەیدەوە لە عەبدوڵلای کوڕی مەسعودەوە، وتی: لەبەر چاومان ئەوەندە کەم بونەوە هەتا وتم بە پیاوێ لە تەنیشتما بوو ئایا حەفتا کەس نین؟ وتی: وا دەزانم سەد کەسن. وتی: پیاوێکام لێ بەدیل گرتن، وتمان ئێوە چەند کەس بوون؟ وتی: هەزار کەس بوین[3]، کاتێ هەردوو لا یەکتریان بینی، موسوڵمانەکان بتپەرستەکانیان بینی دوو ئەوەندەی ئەمانن، پشتیان بەست بە خوداو داوای هاوکاریو یارمەتیان لە خودای مەزن کرد. بت پەرستەکانیش ئەمانیان هەر وا بینیو خەم دڵی داگرتنو کەوتنە ترسو لەرزو ئۆقرەیان لێ بڕا. کاتێ کە لە یەك نزیك کەوتنەوەو دەستیان کرد بە شەڕ، بت پەرستەکانی لەلای موسوڵمانەکان بە کەم نیشانداو ئەمانیشی لە لای ئەوان بە کەم نیشان دا. بۆ ئەوەی هەر یەکەیان پەلاماری ئەوی تر بدات ﴿لِيَقْضِىَ ٱللَّهُ أَمْرًا كَانَ مَفْعُولًا﴾[4] دەبوو کارێ کە خودا بڕیاری دابوو بێتە جێ. واتە: هەق لە ناهەق جیا بکاتەوەو وتەی (لا إله إلا الله) سەربخات بەسەر خوانەناسو ملوڕاندا. خاوەن باوەڕان سەرخاتو بت پەرستان سەر شۆڕ بکات. وەك خودا خۆی دەفەرمووێت: ﴿وَلَقَدْ نَصَرَكُمُ ٱللَّهُ بِبَدْرٍ وَأَنتُمْ أَذِلَّةٌ﴾[5] وا دیتان خودا لە شەڕی بەدرا سەری خستن. لێرەیشدا دەفەرمووێت: ﴿وَٱللَّهُ يُؤَيِّدُ بِنَصْرِهِۦ مَن يَشَآءُ إِنَّ فِى ذَٰلِكَ لَعِبْرَةً

---

[1] الانفال (٤٤).

[2] الطبري (٦/٢٣٤).

[3] الطبري (٦/٢٣٦).

[4] الانفال (٤٤).

[5] آل عمران (١٢٣).

لِّأُوْلِي ٱلْأَبْصَٰرِ﴾ دیارە خودا بە ویستی خۆی هەرکەسێ خۆی حەز بکات سەری دەخات، ئەمەیش پەندە بۆ ئەوانەی خاوەن ئاوەزن. ڕێگای پێ دەردەکەن بۆ لای لە کارزانی خوداو کردارو فەرمانێ کە بڕیاری خۆیەتی، عەبدە خاوەنباوەڕەکانی سەردەخات لە دنیاو لە ڕۆژی قیامەتیشدا.

﴿زُيِّنَ لِلنَّاسِ حُبُّ ٱلشَّهَوَٰتِ مِنَ ٱلنِّسَآءِ وَٱلْبَنِينَ وَٱلْقَنَٰطِيرِ ٱلْمُقَنطَرَةِ مِنَ ٱلذَّهَبِ وَٱلْفِضَّةِ وَٱلْخَيْلِ ٱلْمُسَوَّمَةِ وَٱلْأَنْعَٰمِ وَٱلْحَرْثِ ذَٰلِكَ مَتَٰعُ ٱلْحَيَوٰةِ ٱلدُّنْيَا وَٱللَّهُ عِندَهُۥ حُسْنُ ٱلْمَـَٔابِ (١٤) ۞ قُلْ أَؤُنَبِّئُكُم بِخَيْرٍ مِّن ذَٰلِكُمْ لِلَّذِينَ ٱتَّقَوْا عِندَ رَبِّهِمْ جَنَّٰتٌ تَجْرِى مِن تَحْتِهَا ٱلْأَنْهَٰرُ خَٰلِدِينَ فِيهَا وَأَزْوَٰجٌ مُّطَهَّرَةٌ وَرِضْوَٰنٌ مِّنَ ٱللَّهِ وَٱللَّهُ بَصِيرٌۢ بِٱلْعِبَادِ (١٥)﴾

**باسی ژیانی دنیا**

﴿زُيِّنَ لِلنَّاسِ حُبُّ ٱلشَّهَوَٰتِ مِنَ ٱلنِّسَآءِ وَٱلْبَنِينَ وَٱلْقَنَٰطِيرِ ٱلْمُقَنطَرَةِ مِنَ ٱلذَّهَبِ وَٱلْفِضَّةِ وَٱلْخَيْلِ ٱلْمُسَوَّمَةِ﴾ ئارەزوی ژنان کردن‌و کوڕی زۆرو دەسکەوتنی کۆمەڵێ گەورەی ئاڵتون‌و زیوو ڕەوە ئەسپێ بە دروشم. خودای مەزن باسی خۆشی‌و ڕازاوەی ئەم ژیانی دنیا دەکات لە ئارەزوی جۆراو جۆر لە ژنان‌و کوڕی زۆر لە پێشا باسی ژنان دەکات، چونکە بەڵای ژنان لە هەموو بەڵایەك گەورەترە. وەك لە فەرموودەی سەحیحدا هاتووە کە پێغەمبەر (ﷺ) فەرموویەتی: (لە دوای خۆم هیچ بەڵایەکم بەجێ نەهێشتووە بە زیانتر بێ لەسەر پیاوان لە ژنان).[1] بەڵام ئەگەر مەبەست بە پاك داوێنی‌و زۆری منداڵ بێ، خۆ ئەوە پێویستەو شتێکی زۆر چاکەو سونەتی پێغەمبەری خودایە (ﷺ) وەك چەندین فەرموودە هاتووە کە هانی خاوەنباوەڕان ئەدان بۆ ژن هێنان. (بێگومان لە چاکی ئەم ئوممەتەیە کە ژنیان زۆر بووە)[2] هەروەها پێغەمبەر (ﷺ) فەرموویەتی: (دنیا خێرو خۆشیە، چاکترین خێرو خۆشی دنیاش ئافرەتی چاکە، کاتێ کە سەیری کردووە دڵخۆشی کردوە، ئەگەر فەرمانیشی بەسەرا کرابێ گوێڕایەڵی کردوە، ئەگەر لە لاشی نەبوبێ (ژنەکە) پارێزگاری لە خۆی‌و ماڵی پیاوەکەشی کردووە بۆی)[3] لە فەرموودەیەکی تردا فەرموویەتی: (ژن‌و بۆن خۆشیم لە لا خۆشەویست کراوە، نوێژیشم بۆ کراوەتە چاوڕۆشنی)[4] عائیشە (ڕەزای خوای لێ بێ) وتی: هیچ شتێك نەبووە لە لای

---

[1] فتح الباري (٤١/٩).

[2] فتح الباري (١٥/٩).

[3] مسلم (١٠٩٠/٢).

[4] النسائي في الكبرى (٢٨٠/٥)، فەرموودەیەکی حەسەنە.

پێغەمبەری خودا (ﷺ) خۆشەویستتر بێ لە ژنو ئەسپ.لە ڕیوایەتێکی تردا هاتووە لە ئەسپو ژن.[1]
خۆشەویستی منداڵیش جارێ بۆ شانازی پێوە کردنو جوانیە، ئەمە ئەو باسەیە کە دەیکەن. جاری
واش هەیە بۆزۆر کردنی نەوەو وەچەیەو زۆر کردنی ئوممەتی موحەممەدە(ﷺ) لەو کەسانەی کە
خودا بەتەنیا دەناسنو شەریکی بۆ دانانێن. ئەمە شتێکی زۆر چاکەو جێی ستایشە وەك لەم
فەرمودەیەدا هاتووە: (ئەو ژنانە بخوازن (مارە بکەن) کە بەسۆزو خۆشنوودنو منداڵی زۆریان دەبێ،
چونکە من شانازی دەکەم بە زۆری ئێوەوە لە (ناو) ئوممەتەکانا لە ڕۆژی قیامەتدا).[2] خۆشەویستی
ماڵیش هەر وایە، جاری وا هەیە بۆ فیزو شانازی پێکردو خۆهەڵبڕینو زاڵ کردنە بەسەر بێدەستەڵاتو
هەژاراندا ئەمە شتێکی خراپو بێزراوە. جاری واش هەیە ئەو ماڵە بۆ خێر لێکردنە بۆ کەسو کارو
پەیوەندی خزمایەتیو خۆ نزیك کردنەوەیە لە خودای مەزنو ڕێی چاکەو ڕەزامەندی خودای گەورە،
ئەمە کارێکی زۆر چاكو جێی ستایشە لە شەرعا. زانایانی تەفسیر ڕایان جیاوازە دەربارەی ئەندازەی
(قنطار)، لەسەر چەند ڕایەكو کورتەو پوختەکەی بریتیە لە ماڵێکی زۆر وەك زەححاكو کەسانی تریش
وتویانە[3] (خۆشەویستی ئەسپیش کراوە بە سێ بەشەوە) جارێ خاوەنەکەی ئامادەی دەکات بۆ ڕێی
خودا هەرکاتێ پێویستیان پێی بوو غەزای پێ دەکەنو پاداشتی لەسەر وەردەگرن، جاری واش هەیە
ئەو ئەسپە خاوەنەکەی بەکاری دێنێ بۆ فیزو خۆهەڵبڕین بەسەر خەڵکی موسوڵماندا، ئەوە تاوانو
گوناهە بۆ خاوەنەکەی، جاری واش هەیە ئەو ئەسپە خاوەنەکەی بەکاری دێنێ بۆ سواری خۆیو زیاد
کردنی سكو سزاو هەقی خودایشی لەبیر ناچێ کە لەسەریەتی، ئەمەیش بۆ خاوەنەکەی چاکەو
پێویستی خۆی پێ دەردەکا. بەو زوانە بە تێرو تەواوی فەرموودە دێت لە بارەیەوە بە ویستی خودای
گەورە لەم ئایەتەدا کە خودای مەزن دەفەرمووێت: ﴿وَأَعِدُّوا لَهُم مَّا اسْتَطَعْتُم مِّن قُوَّةٍ وَمِن رِّبَاطِ
الْخَيْلِ﴾[4] تا بۆتان دەکرێ چەكو جبەخانەی شەڕو ئەسپی سواری ئامادە بکەن. بەڵام لە بارەی
(المسومة) ئیبنوعەبباس دەڵێ: واتە: ئەسپی ڕام هێنراوی چاكو بە توانا.[5] هەر بەم شێوەیە ڕیوایەت
کراوە لە موجاهیدو عیکرمەو سەعیدی کوڕی جوبەیرو عەبدوڕەحمانی کوڕی عەبدوڵڵای کوڕی ئەبزێو

---

[1] النسائي (٦/٢١٧)، (٧/٦١) عن أنس، فەرموودەیەکی لاوازە.

[2] إبن حبان (٦/١٣٤)، فەرموودەیەکی حەسەنە.

[3] الطبري (٦/٢٥٠).

[4] الانفال (٦٠).

[5] الطبري (٦/٢٥٢).

سوودیو ڕەبیعی کوڕی ئەنەسو ئەبوسنانو کەسانی تریشەوە[1] مەکحول وتی: (المسومة) واتە: ئەسپی ناوچاوو چوارپەل سپی[2] ئیمامی ئەحمەد ڕیوایەتی کردوە لە ئەبوزەڕەوە (ڕەزای خوای لێ بێ) وتی: پێغەمبەری خودا (ﷺ) فەرموویەتی: (هیچ ئەسپێکی عەرەبی نیە مەگین ڕێی پێدراوە کە هەموو بەرەبەیانێ دوو دوعا بکاتو بڵێت: ئەی خودا منت داوە بە هەرکەسێ لە نەوەی ئادەم، بمکە بە خۆشەویسترین ماڵو کەس لەلای (یان خۆشەویسترین کەسو ماڵی لەلای))[3] هەروەها خودای گەورە دەفەرمووێت: ﴿وَٱلۡأَنۡعَٰمِ وَٱلۡحَرۡثِۗ﴾ ئاژەڵو زەوی کێڵان. واتە: وشترو گاو مانگاو بزنو مەڕو ئەو زەویانەی بەکاردەهێنرێن بۆ کشتوکاڵ. پاشان خودای مەزن دەفەرمووێت: ﴿ذَٰلِكَ مَتَٰعُ ٱلۡحَيَوٰةِ ٱلدُّنۡيَاۖ﴾ ئەمانە بۆ مەردوم ڕازاونەتەوە (لە ژیانی دنیادا مایەی خۆشین)، بەڵام دێنەوە بەر دەستی خودا، پێدەزانن کە زۆر لەوە باشتر هەیە. چونکە ئەو جوانیو ڕازاوەیەی دنیا لەناودەچێو نامێنێ ﴿وَٱللَّهُ عِندَهُۥ حُسۡنُ ٱلۡمَـَٔابِ﴾ پاشەڕۆژی چاك لەلای خودایە.

### پاداشتی لەخوا ترسان زۆر چاکترە لە هەموو خۆشیەکانی دنیا

﴿قُلۡ أَؤُنَبِّئُكُم بِخَيۡرٖ مِّن ذَٰلِكُمۡۖ﴾ پێتان بڵێم چی لەم شتانەی جوانو ڕازاوە کراوە بۆ مەردم لەم ژیانی دنیا کەمو بێ بایەخەدا؟ پاشان خودای گەورە دەفەرمووێت: ﴿لِلَّذِينَ ٱتَّقَوۡاْ عِندَ رَبِّهِمۡ جَنَّٰتٞ تَجۡرِي مِن تَحۡتِهَا ٱلۡأَنۡهَٰرُ﴾ بۆ ئەوانەی لە هەڵە خۆدەپارێزن، لەلای پەروەردگاریانەوە باغاتێکی وایان دەبێ، جۆباریان بەبەردا دەڕوا لە هەموو لایەکەوە، هەریەکێکیان جۆرە تامو ڕەنگێکی هەیە لە هەنگوینو شیرو بادەو ئاوو شتی تر. کە چاو نەیدیوەو گوێ نەیبیستوەو بە دڵی هیچ کەسێکیشا نەهاتووە ﴿خَٰلِدِينَ فِيهَا﴾ هەتا سەر هەر لەوێ دەبنو گۆڕینی بەسەردا نایەت ﴿وَأَزۡوَٰجٞ مُّطَهَّرَةٞ﴾ چەندین ژنی پاكو بێگەرد لە پیسو پۆخڵیو ئازارو سوڕی مانگانەو خوێنی منداڵ بوونو ئەو شتانەی ژنانی دنیا تووشیان دێت ﴿وَرِضۡوَٰنٞ مِّنَ ٱللَّهِۗ﴾ سەرەڕای ئەم هەموو خۆشیەیش، ڕەزای خودایان پێدەگاتو هەرگیز خودا لێیان تووڕە نابێت. هەر بۆیە خودای گەورە لە ئایەتێکی تردا لە سورەتی بەرائەتا (البراءة) دەفەرمووێت: ﴿وَرِضۡوَٰنٞ مِّنَ ٱللَّهِ أَكۡبَرُۚ﴾[4] ڕەزای خودایش لە گشتی گەورەترە.

---

[1] إبن أبي حاتم (٢/١٢٣-١٢٥).

[2] إبن أبي حاتم (٢/١٢٧).

[3] أحمد (٥/١٧٠)، فەرموودەیەکی لاوازە.

[4] التوبة (٧٢).

کە پێی داون کە ئەو بەهەشتە نەبڕاوەیە. پاشان خودای گەورە دەفەرموویێت: ﴿وَٱللَّهُ بَصِيرُۢ بِٱلۡعِبَادِ﴾ خودا چاوی لە عەبدەکانی خۆیەتی. واتە: هەرکەسەو بەپێی شایستەیی خۆی خودا پاداشتی ئەداتەوە.

﴿ٱلَّذِينَ يَقُولُونَ رَبَّنَآ إِنَّنَآ ءَامَنَّا فَٱغۡفِرۡ لَنَا ذُنُوبَنَا وَقِنَا عَذَابَ ٱلنَّارِ ﴿١٦﴾ ٱلصَّٰبِرِينَ وَٱلصَّٰدِقِينَ وَٱلۡقَٰنِتِينَ وَٱلۡمُنفِقِينَ وَٱلۡمُسۡتَغۡفِرِينَ بِٱلۡأَسۡحَارِ ﴿١٧﴾﴾

**دوعای لەخواترسان و ڕەوشتەکانیان**

خودای مەزن ستایشی ئەو عەبدە لەخوا ترسانەی خۆی دەکات کە بەڵێنی پاداشتی زۆری پێداونو دەفەرموویێت: ﴿ٱلَّذِينَ يَقُولُونَ رَبَّنَآ إِنَّنَآ ءَامَنَّا فَٱغۡفِرۡ لَنَا ذُنُوبَنَا﴾ ئەوانەی کە دەڵێن: ئەی پەروەردگارمان، ئێمە بڕوامان پێت هەیە، سا تۆ لە گوناهمان ببورە. واتە: بڕوامان بە کتێبەکەتو بە پێغەمبەرەکەت هێناوە لە گوناهو کەمو کوڕیەکانمان ببورە بە سۆزو بەزەیی خۆت. ﴿وَقِنَا عَذَابَ ٱلنَّارِ﴾ لە سزا دان (بە ئاگر) بمانپارێزە. ﴿ٱلصَّٰبِرِينَ﴾ ئەو کەسانە خۆڕاگرن لە بەجێهێنانی خواپەرستیاو لە دورکەوتنەوە لە قەدەغەکراوەکان ﴿وَٱلصَّٰدِقِينَ﴾ ڕاستگۆنو بڕوایان بەو شتانە هەیە کە خودا فەرمانی پێکردوون بیکەن لە هەر کارێکی سەختو گران ﴿وَٱلۡقَٰنِتِينَ﴾ گوێڕایەڵو ملکەچن ﴿وَٱلۡمُنفِقِينَ﴾ماڵی خۆیان لە ڕێی خوادا بەخت دەکەن بۆ کەسو کارو هەژارانو ئەو کەسانەی کەم دەستن ﴿وَٱلۡمُسۡتَغۡفِرِينَ بِٱلۡأَسۡحَارِ﴾ هەموو ڕۆژێ (سەر لە بەیان) لە خوا دەپاڕێنەوە لێیان خۆش بێ. ئەم دەقە بەڵگەیە لەسەر ڕێزی پاڕانەوەی بەرەبەیان، وتراوە: کاتێ (یەعقوب) بە منداڵەکانی وت: بەو زووانە لە لای خودا داوای لێبوردنتان بۆ دەکەم ﴿سَوۡفَ أَسۡتَغۡفِرُ لَكُمۡ رَبِّيٓ﴾ داوا کردنەکەی بۆ دواخستن بۆ کاتی بەرەبەیان. لە هەردوو سەحیحەکەو موسنەدو سونەنەکاندا هاتووە بە شێوەیەکی تر لە کۆمەڵێ لە هاوەڵەکانەوە، کە پێغەمبەری خودا (ﷺ) فەرموویەتی: (خودای مەزن هەموو شەوێك دێتە ئاسمانی دنیاو کاتێ دواین سێ یەکی شەو دەمێنێ، دەفەرموێت: ئایا کەسێ هەیە داوا بکاو خەڵاتی بکەم؟ ئایا کەسێ هەیە داوا بکاتو داواکەی بۆ جێبەجێ بکەم؟ ئایا کەسێ هەیە داوای لێبوردن بکاتو لێی ببورم؟)[1] لە هەردوو سەحیحەکەشدا هاتووە لە عائیشەوە (ڕەزای

---

[1] فتح الباري (١٣٣/١١)، مسلم (٥٢١/١)، أبوداود (٧٧/٢)، تحفة الاحوذي (٤٧١/٩)، النسائي في الكبرى (١٢٣/٦)، إبن ماجة (٤٣٥/١)، أحمد (٤٨٧/٢).

خوای لێ بێ): پێغەمبەری خودا لە هەموو شەوێکا وەتری کردوە لە سەرەتای (شەودا)، لە ناوەڕاستیدا، لە کۆتاییدا، لە بەرەبەیاندا وەترەکەی کۆتایی پێدەهێنا).[1] عەبدوڵڵای کوڕی عومەر لە شەودا نوێژی دەکرد، پاشان دەیوت: ئەی نافیع، ئایا بەرەبەیان هاتووە؟ ئەگەر بیوتایە: بەڵێ، دەستی دەکرد بە دوعاو پاڕانەوە هەتا ڕۆژ دەبووەوە. (ئیبنوئەبی حاتەم ڕیوایەتی کردوە).[2]

﴿ شَهِدَ اللَّهُ أَنَّهُ لَا إِلَٰهَ إِلَّا هُوَ وَالْمَلَائِكَةُ وَأُولُو الْعِلْمِ قَائِمًا بِالْقِسْطِ ۚ لَا إِلَٰهَ إِلَّا هُوَ الْعَزِيزُ الْحَكِيمُ (١٨) إِنَّ الدِّينَ عِندَ اللَّهِ الْإِسْلَامُ ۗ وَمَا اخْتَلَفَ الَّذِينَ أُوتُوا الْكِتَابَ إِلَّا مِن بَعْدِ مَا جَاءَهُمُ الْعِلْمُ بَغْيًا بَيْنَهُمْ ۗ وَمَن يَكْفُرْ بِآيَاتِ اللَّهِ فَإِنَّ اللَّهَ سَرِيعُ الْحِسَابِ (١٩) فَإِنْ حَاجُّوكَ فَقُلْ أَسْلَمْتُ وَجْهِيَ لِلَّهِ وَمَنِ اتَّبَعَنِ ۗ وَقُل لِّلَّذِينَ أُوتُوا الْكِتَابَ وَالْأُمِّيِّينَ أَأَسْلَمْتُمْ ۚ فَإِنْ أَسْلَمُوا فَقَدِ اهْتَدَوا ۖ وَّإِن تَوَلَّوْا فَإِنَّمَا عَلَيْكَ الْبَلَاغُ ۗ وَاللَّهُ بَصِيرٌ بِالْعِبَادِ (٢٠) ﴾

### شایەتیدان لەسەر ناسینی خودا بەتەنیا

خودای مەزن شایەتی داوە، خودایش بەسە بۆ شایەتی، چونکە خودا چاکترین و دادپەروەرترین و ڕاستگۆ ترین شایەتەکە شایەتی داوەو دەفەرموێت: ﴿ شَهِدَ اللَّهُ أَنَّهُ لَا إِلَٰهَ إِلَّا هُوَ ﴾ خودا خۆی شایەتی داوە کە هیچ کەسێ جگە لە خودا شیاوی پەرستن نیە، هەموو دروستکراوەکان هی ئەون و بەندەی ئەون و نیازیان هەر بەو هەیە. خودا پێویستی بە هیچ شتێ نیە. وەك لە ئایەتێکی تردا دەفەرموێت: ﴿لَّٰكِنِ اللَّهُ يَشْهَدُ بِمَا أَنزَلَ إِلَيْكَ ۖ أَنزَلَهُ بِعِلْمِهِ ۖ وَالْمَلَائِكَةُ يَشْهَدُونَ ۚ وَكَفَىٰ بِاللَّهِ شَهِيدًا ﴾[3] بەڵام خودا شایەتی ئەدات بەوەی کە بۆی ناردووی، بە ئاگاداری خۆی ڕەوانەی کردووە، فریشتەکانیش شایەتی ئەدەن، تەنیا خودا خۆی بەسە شایەت بێ. پاشان خودای گەورە شایەتی فریشتەکان و زانا بە ئەمەکەکانیشی خستۆتە پاڵ شایەتی خۆی و دەفەرموێت: ﴿ شَهِدَ اللَّهُ أَنَّهُ لَا إِلَٰهَ إِلَّا هُوَ وَالْمَلَائِكَةُ وَأُولُو الْعِلْمِ قَائِمًا بِالْقِسْطِ ۚ لَا إِلَٰهَ إِلَّا هُوَ الْعَزِيزُ الْحَكِيمُ ﴾ خودا خۆی ئاگادارەو فریشتەکانی و زانایانی بە ئینسافیشی باش دەزانن کە هیچ کەسێ جگە لە خودا شیاوی پەرستن نیەو هەر خۆیەتی بەدەستەڵاتی لەکارزان. ئەمە ڕێز لێنانێکی گەورەو تایبەتە دەربارەی زانایان لێرەدا، ئەو زانایانەی کە هەمیشە بەئینسافن لە هەموو کات و شوێنێکدا. هەر دەڵێن: ﴿لَا إِلَٰهَ إِلَّا هُوَ الْعَزِيزُ

---

[1] فتح الباري (٢/٥٦٤)، مسلم (١/٥١٢).

[2] إبن أبي حاتم (٢/١٤٥).

[3] النساء (١٦٦).

ٱلۡحَكِيمُ﴾ کە هیچ پەرستراوێك نیە جگە لە خودا کە خاوەن توانایەکی زۆر مەزنەو لە کارزانە لە گفتارو کردارو بەرنامەو بڕیاریدا.

**ئاین تەنیا هەر ئیسلامە**

﴿إِنَّ ٱلدِّينَ عِندَ ٱللَّهِ ٱلۡإِسۡلَٰمُ﴾ لەلای خودا ئاین هەر ئیسلامە. ئەمە ئاگاداریەکە لە لایەن خوداوە کە هیچ ئاینیّ لە لای ئەو لە هیچ کەسیّ قبولّ ناکرێت جگە لە ئاینی ئیسلام، ئەویش شوێن کەوتنی بەرنامەی ئەو پێغەمبەرانەیە لە هەموو کاتێکدا هەتا دواین پێغەمبەریان کە موحەممەدە (ﷺ) کە خودا گشت ڕێگاکانی تری داخستوە، تەنیا لە لای موحەممەدەوە (ﷺ) ڕێگای داوە، هەرکەسیّ گەیشتە لای خودا دوای ڕەوانە کردنی ئەو بە هەر ئاینێکەوە جگە لە شەریعەتەکەی موحەممەد (ﷺ) ئەو ئاینەی لیّ وەرناگیریّ وەك خودای مەزن دەفەرموێت: ﴿وَمَن يَبۡتَغِ غَيۡرَ ٱلۡإِسۡلَٰمِ دِينٗا فَلَن يُقۡبَلَ مِنۡهُ﴾[1] وە هەرکەسیّ جگە لە ئاینی ئیسلام هەر ئاینێکی تری هەبیّ لێی قبوولّ ناکریّ. لەم ئایەتەشدا کە دەفەرموێت: ﴿إِنَّ ٱلدِّينَ عِندَ ٱللَّهِ ٱلۡإِسۡلَٰمُ﴾ ئاینی قبولّ کراو لەلای خودا تەنیا ئیسلامەو بەس.
پاشان خودای مەزن باسی ئەو کەسانە دەکات کە یەکەم جار کتێبیان بۆ ڕەوانە کراو خودا بیانووی بڕین بە ڕەوانە کردنی پێغەمبەرانو ناردنی کتێب بۆیان دەستیان دایە ناهەقی کردن لە یەکتری هەر بۆیە خودای گەورە دەفەرموێت: ﴿وَمَا ٱخۡتَلَفَ ٱلَّذِينَ أُوتُواْ ٱلۡكِتَٰبَ إِلَّا مِنۢ بَعۡدِ مَا جَآءَهُمُ ٱلۡعِلۡمُ بَغۡيَۢا بَيۡنَهُمۡ﴾ دووبەرەکی نەکەوتە نێوان ئەوانەی کە کتێبیان بۆ هاتبوو، دوای ئەوە نەبیّ کە زانینی ڕاستەقینەیان بۆ هات، ئەمەش هەر لەبەر ئەو ئیرەییو ناهەقیە بوو لە نێوان خۆیاندا هەبوو. واتە: ئیرەییان بە یەکتری دەبرد لە نێوان خۆیانداو ناکۆکی دەکەوتە نێوانیانو لە هەق لایان ئەداو ڕقو کینەیان لەیەکتری هەڵدەگرتو پشتیان لە یەکتری دەکردو لە هیچ شتێکا قسەو کرداری یەکتریان قبوولّ نەدەکرد، با قسەو کردارەکانیشی ڕاستو هەق بوایە. پاشان خودای مەزن دەفەرموێت: ﴿وَمَن يَكۡفُرۡ بِـَٔايَٰتِ ٱللَّهِ﴾ هەر کەسێکیش (بە هەر شێوەیە) لە نیشانەکانی خودا حاشا بکات ﴿فَإِنَّ ٱللَّهَ سَرِيعُ ٱلۡحِسَابِ﴾ با بزانن خودا لە لێپرسینەوە زۆر بەپەلە دەپرسێتەوە لەو حاشا کردنەیانو تۆڵەیان لیّ دەسێنیّو سزایان ئەدات لەسەر ئەو دژایەتی کردنەیان بەرانبەر کتێبەکەی.
پاشان خودای مەزن دەفەرموێت: ﴿فَإِنۡ حَآجُّوكَ فَقُلۡ أَسۡلَمۡتُ وَجۡهِيَ لِلَّهِ وَمَنِ ٱتَّبَعَنِ﴾ ئەگەر کێشەت لەگەڵ دەکەن، تۆ هەر بڵیّ: من لەگەڵ پەیڕەوەکانم بە دڵی پاك ڕووی مان کردۆتە خودا. واتە: تەنیا خودا

---

[1] آل عمران (٨٥).

دەپەرستین بە دڵی پاکو خودا هاوەڵی نیەو تاکو تەنیایەو هاوبەشو منداڵو خێزانی نیە. ئەوانەیش پەیڕەوی من دەکەن هەر وا دەڵێن وەک خودای گەورە لە ئایەتێکی تردا دەفەرمووێت: ﴿قُلْ هَٰذِهِۦ سَبِيلِىٓ أَدْعُوٓا۟ إِلَى ٱللَّهِ ۚ عَلَىٰ بَصِيرَةٍ أَنَا۠ وَمَنِ ٱتَّبَعَنِى﴾[1] بڵێ: ئەمە ڕێگای منە، هەم خۆم، هەم ئەو کەسانەش شوێنم کەوتوون (بە بەڵگەوە) بۆ خواناسی بانگ دەکەم.

## ئیسلام ئاینی گشت خەڵکیەو پێغەمبەر (ﷺ) بۆ هەموویان ڕەوانە کراوە

پاشان خودای مەزن فەرمانی داوە بە بەندەو پێغەمبەری خۆی موحەممەد (ﷺ) کە خەڵکی بانگ بکات بۆ ڕێبازو ئاینەکەیو داوا لە ئەهلی هەردوو کتێبەکە کە جوولەکەو مەسیحیەکانو نەخوێندەوارەکانیش کە بت پەرستەکانن کە موسوڵمان بنو گوێڕایەڵی ئەم پەیامە بن کە خودا بەئەوا ناردوویەتی دەفەرمووێت: ﴿وَقُل لِّلَّذِينَ أُوتُوا۟ ٱلْكِتَٰبَ وَٱلْأُمِّيِّۦنَ ءَأَسْلَمْتُمْ ۚ فَإِنْ أَسْلَمُوا۟ فَقَدِ ٱهْتَدَوا۟ ۖ وَّإِن تَوَلَّوْا۟ فَإِنَّمَا عَلَيْكَ ٱلْبَلَٰغُ﴾ ئەو کەسانەش کە ئەهلی کتێبنو بەو کەسانەش کە نەزانن، بڵێ: ئاخۆ ئێوەش وەك من خۆتان هەر بە خودا سپاردووە؟ جا ئەگەر خۆیان سپاردبوو، ئەوا کەوتونەتە سەر ڕێگا، ئەگەر ڕوویان لێ وەرگێڕای تۆ هەر ئەوەندەت لەسەرە ڕابگەیەنی. لێپرسینەوەیان لەلای خودایەو هەر دەگەڕێنەوە بۆ لای ئەو، هەر ئەوە کە ویستی لە هەر کەسێ بوو ڕێی نیشان ئەداتو ویستیشی لە هەرکەسێ بێ گومڕای دەکات. لەکارزانەو خۆی چاك دەزانێ چی دەکات. هەر بۆیە دەفەرمووێت: ﴿وَٱللَّهُ بَصِيرٌۢ بِٱلْعِبَادِ﴾ خودا خۆی شارەزای بەندەکانیەتی. واتە: خودا خۆی دەزانێ کێ شایەنی ڕاستەڕێیەو کێش شایەنی گومڕاییە. ئەو خودایەکە: ﴿لَا يُسْـَٔلُ عَمَّا يَفْعَلُ وَهُمْ يُسْـَٔلُونَ﴾[2] چی ئەو بیکات ناشێ پرسیاری لێ بکرێو ئەوانن کە بەرپرسیارن. ئەمەیش لەبەر بەزەیيو لەکارزانی خودا خۆیەتی. ئەم ئایەتەو وێنەی ئەم ئایەتە ئاشکراترین بەڵگەن لەسەر گشتگیری ڕەوانە کردنی پێغەمبەر (ﷺ) بۆ هەموو خەڵکی، وەك لە ئاینەکەیەوە دیارەو قورئانو فەرموودەیش لە زۆر شوێنا ئاماژەیان پێکردووە، لەو ئایەتانە، خودای مەزن دەفەرمووێت: ﴿قُلْ يَٰٓأَيُّهَا ٱلنَّاسُ إِنِّى رَسُولُ ٱللَّهِ إِلَيْكُمْ جَمِيعًا﴾[3] بڵێ: ئەی خەڵکینە بزانن من ڕاسپاردەی خودام بۆ لای هەمووتان. هەروەها دەفەرمووێت:

---

[1] یوسف (١٠٨).

[2] الانبیاء (٢٣).

[3] الاعراف (١٥٨).

﴿تَبَارَكَ ٱلَّذِي نَزَّلَ ٱلْفُرْقَانَ عَلَىٰ عَبْدِهِۦ لِيَكُونَ لِلْعَٰلَمِينَ نَذِيرًا﴾[1] پاکو بێ عەیبی بۆ خودایێ کە ئەم فورقانەی (قورئانەی) بۆ عەبدی خۆی ناردۆتە خوار، تا ببێتە هۆی ئاگاداری بۆ هەموو خەڵکی جیهان. لە هەردوو سەحیحەکەو سونەنەکانی تریشدا هاتووە کە گەیشتۆتە پلەی تەواتور بە چەندین ڕووداو کە پێغەمبەری خودا نامەکانی خۆی ناردووە بۆ پاشاو سەرۆکەکانی دنیا لە نەوی ئادەم لە عەرەبو عەجەمو ئەهلی کتێبو ئەوانەش نەخوێندەوارن بەپێی ئەو فەرمانەی کە خودا پێی داوە لەو بارەیەوە.[2] عەبدورەزاق ڕیوایەتی کردوە لە موعەمەرەوە لە هەممامەوە لە ئەبوهورەیرەوە لە پێغەمبەرەوە (ﷺ) کە فەرموویەتی: (سوێند بەو کەسەی گیانی منی بەدەستە هیچ کەسێ لەم ئوممەتە گوێی لە من نابێ. جوولەکە بێ یا گاور، پاشان مردبێو بڕوای بەوە نەهێنابێ کە من پێی ڕەوانە کراوم مەگین ئەوە لە خەڵکی ناو ئاگرە)[3] موسلیم ڕیوایەتی کردوە. وە فەرموویەتی: (ڕەوانە کراوم بۆ سوورو ڕەشیشی) فەرموویەتی: (پێغەمبەری وا بووە هەر ڕەوانە کراوە بۆ هۆزەکەی خۆی بەتایبەتی. من ڕەوانە کراوم بۆ خەڵکی بەگشتی)[4].

﴿إِنَّ ٱلَّذِينَ يَكْفُرُونَ بِـَٔايَٰتِ ٱللَّهِ وَيَقْتُلُونَ ٱلنَّبِيِّۦنَ بِغَيْرِ حَقٍّ وَيَقْتُلُونَ ٱلَّذِينَ يَأْمُرُونَ بِٱلْقِسْطِ مِنَ ٱلنَّاسِ فَبَشِّرْهُم بِعَذَابٍ أَلِيمٍ ﴿٢١﴾ أُو۟لَٰٓئِكَ ٱلَّذِينَ حَبِطَتْ أَعْمَٰلُهُمْ فِى ٱلدُّنْيَا وَٱلْـَٔاخِرَةِ وَمَا لَهُم مِّن نَّٰصِرِينَ ﴿٢٢﴾﴾

### زەمی جوولەکە لەسەر خوانەناسیو کوشتنی پێغەمبەرانو پیاوچاکان

﴿إِنَّ ٱلَّذِينَ يَكْفُرُونَ بِـَٔايَٰتِ ٱللَّهِ وَيَقْتُلُونَ ٱلنَّبِيِّۦنَ بِغَيْرِ حَقٍّ﴾ ئەو کەسانەی لە نیشانەکانی خودا حاشایان کردو پێغەمبەرەکانی خۆیان (بە خوتو خۆڕایی) دەکوشتن. خودای گەورە لێرەدا سەرزەنشتی ئەهلی کتێب دەکات بەوەی کە پێی هەڵساون لە تاوانو خراپەکاریو حاشاکردنیان لە پێغەمبەرەکانیانو بڕوا نەکردنیان بە نیشانەکانی خودا هەر لە دێرزەمانەوەو ئێستاش کە پێغەمبەرەکانیان ئاگاداریان کردون لێیان. لەبەر فیز زلیو لاساریو خۆ بە زل زانین بەرانبەر بە هەق بە شوورەییان دادەنا کە شوێنی بکەون، لەگەڵ ئەوەیشدا چەندین پێغەمبەریشیان کوشت کاتێ کە پەیامی خودایان پێ دەگەیاندن، بەبێ ئەوەی هیچ خراپەو تاوانێکیان دەربارەیان کردبێ. تەنیا ئەوە

[1] الفرقان (١).

[2] فتح الباري (٤٢/١)، مسلم (١٩٩٣/٤).

[3] مسلم (١٣٤/١).

[4] مسلم (٣٧٠/١)، البخاري (٣٣٥).

نەبێ کە بانگیان دەکردن بۆ سەر ڕێی ڕاست ﴿وَيَقْتُلُونَ ٱلَّذِينَ يَأْمُرُونَ بِٱلْقِسْطِ مِنَ ٱلنَّاسِ﴾ ئەوانەشیان دەکوشت کە فەرمانی چاکەیان بە خەڵکی ئەدا. ئەمە ئەوپەڕی خۆ بەزل زانیان بوو، وەك پێغەمبەری خودا (ﷺ) فەرموویەتی: (خۆ بەزل زانی وەرنەگرتنی هەقەو بە کەم زانینی خەڵکە)[1] هەر بۆیە کاتێ خۆیان بە زل زانی بەرانبەر بە هەق و فیزیان کرد بەسەر خەڵکدا خودای گەورەیش هەر بەو شێوەیە مامەڵەی لەگەڵا کردن لە دنیادا بە سووکی و ڕیسوایی و لە ڕۆژی قیامەتیشدا بە جەزرەبەی توندو ئابڕووبەر. وەك دەفەرمووێت: ﴿فَبَشِّرْهُم بِعَذَابٍ أَلِيمٍ﴾ مژدەیان بدەرێ بە جەزرەبەی پڕ بە ژان. پاشان خودای مەزن دەفەرمووێت: ﴿أُولَٰٓئِكَ ٱلَّذِينَ حَبِطَتْ أَعْمَٰلُهُمْ فِى ٱلدُّنْيَا وَٱلْءَاخِرَةِ وَمَا لَهُم مِّن نَّٰصِرِينَ﴾ ئەوانە لە دنیاو لە قیامەتدا هەر کارێ بکەن بەفیڕۆ دەچێ و هیچ کەس بە هانایانەوە نایە.

﴿أَلَمْ تَرَ إِلَى ٱلَّذِينَ أُوتُوا۟ نَصِيبًا مِّنَ ٱلْكِتَٰبِ يُدْعَوْنَ إِلَىٰ كِتَٰبِ ٱللَّهِ لِيَحْكُمَ بَيْنَهُمْ ثُمَّ يَتَوَلَّىٰ فَرِيقٌ مِّنْهُمْ وَهُم مُّعْرِضُونَ ﴿٢٣﴾ ذَٰلِكَ بِأَنَّهُمْ قَالُوا۟ لَن تَمَسَّنَا ٱلنَّارُ إِلَّآ أَيَّامًا مَّعْدُودَٰتٍ وَغَرَّهُمْ فِى دِينِهِم مَّا كَانُوا۟ يَفْتَرُونَ ﴿٢٤﴾ فَكَيْفَ إِذَا جَمَعْنَٰهُمْ لِيَوْمٍ لَّا رَيْبَ فِيهِ وَوُفِّيَتْ كُلُّ نَفْسٍ مَّا كَسَبَتْ وَهُمْ لَا يُظْلَمُونَ ﴿٢٥﴾﴾

**زەمی ئەهلی کتێب لەسەر ڕازی نەبونیان بە کتێبی خودا**

﴿أَلَمْ تَرَ إِلَى ٱلَّذِينَ أُوتُوا۟ نَصِيبًا مِّنَ ٱلْكِتَٰبِ يُدْعَوْنَ إِلَىٰ كِتَٰبِ ٱللَّهِ لِيَحْكُمَ بَيْنَهُمْ ثُمَّ يَتَوَلَّىٰ فَرِيقٌ مِّنْهُمْ وَهُم مُّعْرِضُونَ﴾ خۆ تۆ بینیت، ئەو کەسانەی کە لە کتێبی ئێمەدا بەشێکیان پێ گەیشتبوو. خۆیان وتیان: بە هەر بڕیارێ خودا بیدا ئێمە ڕازین، کەچی هەندێك لەوانە پێی ڕازی نەبوون. خودای مەزن لێرەدا ناڕەزایی خۆی دەردەبڕێ دەربارەی گاوڕو جولەکەکان، وەك خۆیان دەڵێن بەو کتێبانەی کە بۆیان هاتووە کە تەوراتو ئینجیلە. کاتێکیش داوایان لێ بکرێ کە گوێڕایەڵی فەرمانی خودا بکەن بەپێی ئەو کتێبانە کە بۆیان هاتووە کە شوێن کەوتنی موحەممەدە (ﷺ) کەچی پشت هەڵدەکەن و پێی ڕازی نابن. ئەمە ئەوپەڕی ناڕەزایی دەربڕینو سەرکۆنە کردنیانە لەسەر ئەو لاساریو دژایەتی کردنەیان. پاشان خودای گەورە دەفەرمووێت: ﴿ذَٰلِكَ بِأَنَّهُمْ قَالُوا۟ لَن تَمَسَّنَا ٱلنَّارُ إِلَّآ أَيَّامًا مَّعْدُودَٰتٍ﴾ چونکە ئەمانە دەیانوت: ئێمە ئەگەر بشمانخەنە جەهنەم، چەند ڕۆژێك زیاتری پێ ناچێ، ڕزگار دەبین. ئەوەی کە پاڵی پێوە دەنێ و بوێرانە دژایەتی هەق دەکەن و درۆ هەڵبەستنیانە بە دەم خوداوە کە دەڵێن: ئێمە

[1] مسلم (٩٣/١).

چەند ڕۆژێك نەبێ سزا نادرێن. واتە: تەنیا حەوت ڕۆژ لەناو ئاگرا سزا ئەدرێن، هەر لە باتی هەزار ساڵ لە دنیادا یەك ڕۆژ سزا ئەدرێن. لە پێشەوە لە سورەتی بەقەرەدا تەفسیری ئەمە کراوە. پاشان خودای مەزن دەفەرمووێت: ﴿وَغَرَّهُمْ فِي دِينِهِم مَّا كَانُوا۟ يَفْتَرُونَ﴾ بەو درۆیە بۆ ئاینی خۆیان هەڵیان بەست، خۆیان پێ خەڵەتاندووە. کە بە ئاگر سزا نادرێن چەند ڕۆژێك نەبێ. ئەم قسەیە هەر خۆیان هەڵیان بەستووە. خودا هیچ بەڵێنێکی پێ نەداون، بەڵکو هەڕەشەیان لێ دەکاو دەفەرمووێت: ﴿فَكَيْفَ إِذَا جَمَعْنَٰهُمْ لِيَوْمٍ لَّا رَيْبَ فِيهِ وَوُفِّيَتْ كُلُّ نَفْسٍ مَّا كَسَبَتْ وَهُمْ لَا يُظْلَمُونَ﴾ جا کە ئەو ڕۆژە دێت چی دەکەن، کە بێگومان هەر وەدی دێتو هەموویان کۆدەکەینەوە، هەرکەس هەرچی کردووە دێتەوە ڕێیو ناهەقی لە کەس ناکرێ؟ واتە: لەو ڕۆژەدا حاڵیان چۆنە کە درۆیان بە دەم خوداوە کردوەو بڕوایان بە پێغەمبەرەکەی نەکردوەو پێغەمبەرانو پیاوچاکانو زانایانی خۆیان کوشتووە کە فەرمانیان دەکرد بە چاکەو ڕێگریان دەکرد لە خراپە. خودای مەزن پرسیاریان لێ دەکات لە بارەی ئەوانەوە هەموو. لێپرسینەوەیان لەگەڵا دەکاتو تۆڵەیان لێ دەسێنێ لەسەری هەر بۆیە دەفەرمووێت: ﴿فَكَيْفَ إِذَا جَمَعْنَٰهُمْ لِيَوْمٍ لَّا رَيْبَ فِيهِ وَوُفِّيَتْ كُلُّ نَفْسٍ مَّا كَسَبَتْ وَهُمْ لَا يُظْلَمُونَ﴾.

﴿قُلِ ٱللَّهُمَّ مَٰلِكَ ٱلْمُلْكِ تُؤْتِى ٱلْمُلْكَ مَن تَشَآءُ وَتَنزِعُ ٱلْمُلْكَ مِمَّن تَشَآءُ وَتُعِزُّ مَن تَشَآءُ وَتُذِلُّ مَن تَشَآءُ بِيَدِكَ ٱلْخَيْرُ إِنَّكَ عَلَىٰ كُلِّ شَىْءٍ قَدِيرٌ (٢٦) تُولِجُ ٱلَّيْلَ فِى ٱلنَّهَارِ وَتُولِجُ ٱلنَّهَارَ فِى ٱلَّيْلِ وَتُخْرِجُ ٱلْحَىَّ مِنَ ٱلْمَيِّتِ وَتُخْرِجُ ٱلْمَيِّتَ مِنَ ٱلْحَىِّ وَتَرْزُقُ مَن تَشَآءُ بِغَيْرِ حِسَابٍ (٢٧)﴾

### ڕێنمایی بۆ شوکرانە بژێری

﴿قُلِ ٱللَّهُمَّ مَٰلِكَ ٱلْمُلْكِ تُؤْتِى ٱلْمُلْكَ مَن تَشَآءُ وَتَنزِعُ ٱلْمُلْكَ مِمَّن تَشَآءُ وَتُعِزُّ مَن تَشَآءُ وَتُذِلُّ مَن تَشَآءُ﴾ بڵێ: خودایە، ئەی خاوەن هێزو دەسەڵات هەرکەس خۆت بتەوێ دەسەڵاتی پێ ئەدەیو کێش خۆت حەزکەی دەسەڵاتی لێ دەستێنی، هەرکەسیش ڕێز لێ بگرێو هەرکەسیش زەبوون بکەی خۆت دەیزانی. واتە: ئەی موحەممەد (ﷺ) پەروەردگارت زۆر مەزن پاگرەو سوپاس گوزاری بەو کارەکانت گشت بسپێرە بە خوداو هەر پشت بەو ببەستەو بڵێ: ئەی خودایە هەر تۆ بەهرە بەخشیو هەر تۆش دەیگریتەوە. هەرچیت بوێ دەیکەیو، هەرچیش تۆ نەتەوێ نابێ، ئەم ئایەتە ڕێنماییو ئاگاداری تێدایە بۆ شوکر کردنی بەهرەکانی خودا لەسەر پێغەمبەرەکەیو (ﷺ) ئەم ئوممەتەی، چونکە خودای گەورە پێغەمبەریەتی گوێزایەوە لە نەوەی ئیسرائیلەوە بۆ لای پێغەمبەرێکی عەرەبی قورەیشی خەڵکی مەککە کە نەخوێندەوار بوو، کە دوایین پێغەمبەرەو ڕەوانە کراوە بۆ گشت مرۆڤو

جنۆکە. کە هەرچی چاکەکانی پێش خۆی تیا وەدی هێناوەو کۆکردۆتەوە تێیدا، لەگەڵ ئەوەیشا چەندین تایبەتمەندی پێداوە کە بە هیچ پێغەمبەرێکی تری نەداوە لە پێغەمبەرەکانی خۆی. لە زانیاری دەربارەی خوداو شەریعەتەکەی‌و ئاگادارکردنی لەو شتە نادیارانەی پێشوو ئەوانەشی کە لەمەوبەدوا دێن. دەرخستنی ڕووداوەکانی ڕۆژی قیامەت بۆی‌و بڵاوکردنەوەی ئوممەتەکەی لەسەر زەمیندا لە ڕۆژهەڵاتەوە هەتا ڕۆژئاواو سەرخستنی ئاینەکەی بەسەر گشت ئاینەکان‌و شەریعەتەکانی ترا. بەردەوام سەلام‌و ستایش لەسەر پێغەمبەری خودا بێ (ﷺ) هەتا ڕۆژی قیامەت، هەر بۆیە خودای مەزن دەفەرمووێت: ﴿ قُلِ ٱللَّهُمَّ مَٰلِكَ ٱلْمُلْكِ﴾ ئەی موحەممەد (ﷺ) بڵێ: خودایە، ئەی خاوەن هێزو دەسەڵات، هەر خۆت خاوەن توانای دەربارەی دروستکراوەکانت، هەرچیت بوێ دەیکەی. وەك چۆن خودا بەرپەرچی ئەو کەسانەی داوەتەوە کە دەست دەخەنە کارەکانی‌و دەفەرمووێت: ﴿وَقَالُوا۟ لَوْلَا نُزِّلَ هَٰذَا ٱلْقُرْءَانُ عَلَىٰ رَجُلٍ مِّنَ ٱلْقَرْيَتَيْنِ عَظِيمٍ﴾[1] وتیان: بۆ ئەم قورئانە بۆ پیاوێکی بەڕێزو قەدری ئەم دوو شارە نەهاتە خوار؟ خودای مەزن وەڵامیان ئەداتەوەو دەفەرمووێت: ﴿رَحْمَتَ رَبِّكَ﴾[2] ئایا ئەوان بەزەیی پەروەردگاری تۆ دابەش دەکەن؟ واتە: ئێمە کاروباری دروستکراوەکانمان بەڕێوەدەبەین هەرچۆنێ بمانەوێ، بێ ڕێگری‌و پاڵپشتی هیچ کەسێ‌و کارەکانمان پڕە لە کارزانی لەو بارەیەوە. ئا بەو شێوەیە پێغەمبەریەتی خەڵات دەکەین بەو کەسەی مەیلمان لێی بێ. وەك دەفەرمووێت: ﴿ٱللَّهُ أَعْلَمُ حَيْثُ يَجْعَلُ رِسَالَتَهُۥ﴾[3] خودا خۆی باشتر دەزانێ چ کەسێ بۆ پێغەمبەری هەڵدەبژێرێ. وە دەفەرمووێت: ﴿ ٱنظُرْ كَيْفَ فَضَّلْنَا بَعْضَهُمْ عَلَىٰ بَعْضٍ﴾[4] بڕوانە، چۆن هەندێکامان لەچاو هەندێك سەرخستووە. پاشان لێرەدا دەفەرمووێت: ﴿تُولِجُ ٱلَّيْلَ فِى ٱلنَّهَارِ وَتُولِجُ ٱلنَّهَارَ فِى ٱلَّيْلِ﴾ شەو دەخەیتە ناو ڕۆژەوەو ڕۆژیش دەخەیتە ناو شەوەوە. واتە: لە نوێژی شەو هەڵدەگری دەیخەیتە سەر ڕۆژو وەك یەکیان لێ دەکەی‌و پاشان لە ڕۆژ دەگری‌و شەوی پێ زیاد دەکەی، بەو شێوەیە شەوو ڕۆژ کەم‌و زیاد پێ دەکەی چوار فەسڵەکە بەهارو هاوین‌و پایزو زستان پەیدا دەبێت. ﴿وَتُخْرِجُ ٱلْحَىَّ مِنَ ٱلْمَيِّتِ وَتُخْرِجُ ٱلْمَيِّتَ مِنَ ٱلْحَىِّ﴾ زیندوو لە مردوو دەردەخەی‌و مردوو لە زیندوو دەردێنی. واتە: دانەوێڵە لە

---

[1] الزخرف (٣١).

[2] الزخرف (٣٢).

[3] الانعام (١٢٤).

[4] الاسراء (٢١).

کشتوکاڵ دەردێنیو کشتوکاڵیش لە دانەوێڵە دەردێنیو لە دەنکە خورما خورما دەردێنیو لە خورمایش دەنکە خورما دەردێنی. خواناس لە خوانەناسو خوانەناس لە خواناس دەردێنیو هێلکە لە مریشکو مریشك لە هێلکە دەردێنی. هەر بەم شێوەیە لە شتەکانی تریشدا دەیکەی. ﴿وَتَرۡزُقُ مَن تَشَآءُ بِغَيۡرِ حِسَابٍ﴾ هەرکەسێ خۆت بتەوێ بێ هەژمار بژێوی پێ ئەدەی. واتە: هەرکەسێ مەیلت لێ بێ ئەوەندە سامانی پێ ئەدەی لە توانایدا نەبێ هەژماری بکا. هەرکەسیش مەیلت لێ بێ ئەوەندە هەژاری دەکەی کە هیچ شك نابات بژێوی خۆی پێ دەرکات، ئەمەیش لە تواناو دەستەڵاتو دادپەروەریو لەکارزانی خۆتە.

﴿لَّا يَتَّخِذِ ٱلۡمُؤۡمِنُونَ ٱلۡكَٰفِرِينَ أَوۡلِيَآءَ مِن دُونِ ٱلۡمُؤۡمِنِينَۖ وَمَن يَفۡعَلۡ ذَٰلِكَ فَلَيۡسَ مِنَ ٱللَّهِ فِي شَيۡءٍ إِلَّآ أَن تَتَّقُواْ مِنۡهُمۡ تُقَىٰةٗۗ وَيُحَذِّرُكُمُ ٱللَّهُ نَفۡسَهُۥۗ وَإِلَى ٱللَّهِ ٱلۡمَصِيرُ ٢٨﴾

### ڕێگری لە دۆستایەتی کردنی بتپەرستان

خودای مەزن دەفەرموێت: ﴿لَّا يَتَّخِذِ ٱلۡمُؤۡمِنُونَ ٱلۡكَٰفِرِينَ أَوۡلِيَآءَ مِن دُونِ ٱلۡمُؤۡمِنِينَ﴾ باوەڕداران، با جگە لە باوەڕداران نەگرن بە دۆست. خودای گەورە ڕێگری کردوە لە عەبدە خاوەن باوەڕەکانی کە خوانەناسان بکەنە دۆستی خۆیانو واز لە موسوڵمانان بێننو لە ژێرەوە دۆستایەتی لەگەڵ خوانەناساندا بکەن. هەڕەشە لەو کەسانە دەکات کاری وا دەکەنو دەفەرموێت: ﴿وَمَن يَفۡعَلۡ ذَٰلِكَ فَلَيۡسَ مِنَ ٱللَّهِ فِي شَيۡءٍ﴾ ئەی کۆمەڵی خاوەن باوەڕان مەبنە دۆستی دوژمنانی منو خۆتان. ئێوە دۆستایەتی خۆتان بەوانە ڕادەگەیەنن. هەتا دەگاتە. ﴿وَمَن يَفۡعَلۡهُ مِنكُمۡ فَقَدۡ ضَلَّ سَوَآءَ ٱلسَّبِيلِ﴾[1] کێ لە ئێوە ئەو کارە بکات، ڕێگەی ڕاستی لێ تێکچووە. هەروەها دەفەرموێت: ﴿يَٰٓأَيُّهَا ٱلَّذِينَ ءَامَنُواْ لَا تَتَّخِذُواْ ٱلۡكَٰفِرِينَ أَوۡلِيَآءَ مِن دُونِ ٱلۡمُؤۡمِنِينَۚ أَتُرِيدُونَ أَن تَجۡعَلُواْ لِلَّهِ عَلَيۡكُمۡ سُلۡطَٰنٗا مُّبِينًا﴾[2] ئەی کۆمەڵی خاوەن باوەڕان جگە لە خاوەن باوەڕان مەبنە دۆستی خوانەناسان، ئایا ئێوە دەتانەوێ بەڵگەیەکی بە ئاشکرای دژی خۆتان بدەن بە خوا؟ ﴿يَٰٓأَيُّهَا ٱلَّذِينَ ءَامَنُواْ لَا تَتَّخِذُواْ ٱلۡيَهُودَ وَٱلنَّصَٰرَىٰٓ أَوۡلِيَآءَۘ بَعۡضُهُمۡ أَوۡلِيَآءُ بَعۡضٖۚ وَمَن يَتَوَلَّهُم مِّنكُمۡ فَإِنَّهُۥ مِنۡهُمۡ﴾[3] ئەی کۆمەڵی خاوەن باوەڕان مەبنە دۆستی ئەم گاورو

---

[1] الممتحنة (١).

[2] النساء (١٤٢).

[3] المائدة (٥١).

جوولەکانە، با ئەوان دۆستی یەکتر بن. هەرکەسێکیش لە ئێوە ببێتە دۆستیان، ئەویش لەوان دەژمێردرێ. دوای ئەوە کە خودای مەزن باسی دۆستایەتی خاوەن باوەڕان دەکات بۆ یەکتری لە نێوان عەرەبە کۆچەریەکان و خاوەن باوەڕە کۆچەری و ئەنسارەکان دەفەرمووێت: ﴿ وَٱلَّذِينَ كَفَرُوا۟ بَعْضُهُمْ أَوْلِيَآءُ بَعْضٍ ۚ إِلَّا تَفْعَلُوهُ تَكُن فِتْنَةٌ فِى ٱلْأَرْضِ وَفَسَادٌ كَبِيرٌ ﴾[1] بەرەی خوانەناسانیش دۆستی نزیکی یەکترین، ئەگەر ئێوە (وەك من پێم وتوون) ڕەفتار نەکەن پشێوی و خراپەی زۆر لەم سەر زەمینە ڕوو ئەدات. پاشان خودای مەزن لێرەدا دەفەرمووێت: ﴿إِلَّآ أَن تَتَّقُوا۟ مِنْهُمْ تُقَىٰةً﴾ جا مەگین لێیان بترسن و لە ناچاری پێیان بڵێن: ئێمە دۆستی ئێوەین. واتە: مەگین لە هەندێ وڵاتا یان هەندێ کاتا لەبەر ناچاری لێیان بترسن. ئەوەیش بە شێوەیەکی سەرزارەکی بێ و لە دڵا خۆشتان نەوێن و ڕقتان لێیان بێ. وەك بوخاری گێڕاویەتەوە لە ئەبودەردائەوە کە دەڵێن: (ئێمە پێدەکەنین بە ڕووی کۆمەڵێکا کەچی دڵەکانمان نەفرینیان لێدەکات).[2] حەسەن وتی: ئەو خۆپاراستنە هەتا ڕۆژی قیامەتە. پاشان خودای مەزن دەفەرمووێت: ﴿وَيُحَذِّرُكُمُ ٱللَّهُ نَفْسَهُۥ﴾ خودا دەیەوێ بەڕاستی هەر لەو بترسن. واتە: خاوەنباوەڕان هەر لە دەسەڵات و سزای ئەو بترسن و دوژمنی خودا نەکەنە دۆستی خۆیان و دژایەتی دۆستانی نەکەن. پاشان دەفەرمووێت: ﴿وَإِلَى ٱللَّهِ ٱلْمَصِيرُ﴾ پاشەڕۆژتان بۆلای خودایە. بۆ لای ئەو دەگەڕێنەوە و هەرکەسە و لەسەر ئاکاری خۆی پاداشتی ئەدرێتەوە.

﴿ قُلْ إِن تُخْفُوا۟ مَا فِى صُدُورِكُمْ أَوْ تُبْدُوهُ يَعْلَمْهُ ٱللَّهُ ۗ وَيَعْلَمُ مَا فِى ٱلسَّمَٰوَٰتِ وَمَا فِى ٱلْأَرْضِ ۗ وَٱللَّهُ عَلَىٰ كُلِّ شَىْءٍ قَدِيرٌ ﴿٢٩﴾ يَوْمَ تَجِدُ كُلُّ نَفْسٍ مَّا عَمِلَتْ مِنْ خَيْرٍ مُّحْضَرًا وَمَا عَمِلَتْ مِن سُوٓءٍ تَوَدُّ لَوْ أَنَّ بَيْنَهَا وَبَيْنَهُۥٓ أَمَدًۢا بَعِيدًا ۗ وَيُحَذِّرُكُمُ ٱللَّهُ نَفْسَهُۥ ۗ وَٱللَّهُ رَءُوفٌۢ بِٱلْعِبَادِ ﴿٣٠﴾ ﴾

**خودا دەزانێ بەوەی لەناو دڵدایە و کرداری گشت بەندەکانی لە ڕۆژی قیامەتدا ئامادە دەکات و دەری دەخات**

خودای مەزن دەفەرمووێت: ﴿ قُلْ إِن تُخْفُوا۟ مَا فِى صُدُورِكُمْ أَوْ تُبْدُوهُ يَعْلَمْهُ ٱللَّهُ ۗ وَيَعْلَمُ مَا فِى ٱلسَّمَٰوَٰتِ وَمَا فِى ٱلْأَرْضِ ﴾ بڵێ: ئەوەی وا لە دڵتاندایە ئەگەر بیشارنەوە یا دەریخەن، خودا دەیزانێ و هەرچیەکیش لە ئاسمانان و زەمیندایە. خودای گەورە عەبدەکانی ئاگادار دەکاتەوە کە هەرچی بشارنەوە لە دڵیاندا و هەرچیش دەربخەن دەزانێ. چونکە خودا هیچ شتێکی لێ ون نابێ و ئاگای لێیەتی و لە هەر کات و

---

[1] الانفال (٧٣).

[2] فتح الباري (١٠/٥٤٤).

شوێنێکا لە ئاسمانەکانو زەمیندا بە ئەندازەی گەردیلەیە بێ یان بچووکتریش لە هەموو کیشوەرەکانداو لەناو دەریاو کێوەکانیشدا ﴿وَاللَّهُ عَلَىٰ كُلِّ شَيْءٍ قَدِيرٌ﴾ خودا ئاگادارەو توانای بەسەر هەموو شتێکا هەیە. ئەمە ئاگاداریەکە لەلایەن خوداوە دەربارەی عەبدەکانی کە دەیانترسێنێو داوایان لێ دەکات کە هەر لەو بترسن بۆ ئەوەی ئەو کارانە نەکەن کە خودا ڕێگری لێ کردوونو لێیان بڕەنجێ. چونکە خودا ئاگاداری هەموو شتێکیانەو دەتوانێ زوو تۆڵەیان لێ بسێنێ. خۆ ئەگەر مۆڵەتی هەندێکی ئەداتو زوو تۆڵەی لێ ناسێنێ. بۆ ئەوەیە زیاتر لە تاواندا ڕۆبچن، پاشان زۆر بە توندی دەیانگرێو سزایان ئەدات. هەر بۆیە دوای ئەوە دەفەرموێت: ﴿يَوْمَ تَجِدُ كُلُّ نَفْسٍ مَّا عَمِلَتْ مِنْ خَيْرٍ مُّحْضَرًا﴾ لەو ڕۆژەدا کە هەموو کەس کردەوەی خۆی چاکو خراپ لەبەر چاوی خۆی دەبینێ. لە ئایەتێکی تریشدا دەفەرموێت: ﴿يُنَبَّأُ الْإِنسَانُ يَوْمَئِذٍ بِمَا قَدَّمَ وَأَخَّرَ﴾[1] لەو ڕۆژەدا مرۆڤ هەواڵی پێدەدرێ، چی پێشەکی بەڕێ کردوەو چیشی لە دوا بەجێ ماوە. واتە: ئەوەی لە ئاکاری چاک کردبێتی دەیبینێو دڵخۆشی دەکاتو ئەوەیش لە خراپەکانی دەیبینێ غەمگینو دڵگرانی دەکات ئاواتەخوازە ئەو کردارانە هی ئەو نەبوایەو لێیەوە دووربوایە. وەك دەڵێت بە شەیتانەی کە لە دنیا لەگەڵی بووەو ئەو هەڵی ناوە ئەو کارە ناپەسەندانە بکات، وەك خودای مەزن دەفەرموێت: ﴿يَا لَيْتَ بَيْنِي وَبَيْنَكَ بُعْدَ الْمَشْرِقَيْنِ فَبِئْسَ الْقَرِينُ﴾[2] خۆزگە ماوەی نێوان منو تۆ بە ئەندازەی نێوان خۆرهەڵاتو خۆرنشین لە یەکتر دوور بوایە. پاشان خودای گەورە هەڕەشەی زۆر توندیان لێ دەکاتو دەفەرموێت: ﴿وَيُحَذِّرُكُمُ اللَّهُ نَفْسَهُ﴾ هەر دەبێ لەبەر خودا خۆتان بپارێزنو لە تۆڵەی ئەو بترسن. پاشان خودای مەزن فەرمان دەکات بە بەندەکانی نابێ لە سۆزو بەزەیی ئەو بێ ئومێد بن ﴿وَاللَّهُ رَءُوفٌ بِالْعِبَادِ﴾ خودا بەرانبەر بە عەبدەکانی خۆی دلۆڤانە. حەسەنی بەسری وتی: لە سۆزو بەزەیی خودایە کە عەبدەکانی دەترسێنێ لە خۆی، کەسانی تریش هەر وایان وتووە[3] واتە: دلۆڤانە بەرانبەر عەبدەکانیو پێی خۆشە لەسەر ڕاستەڕێو ئاینە تێرو تەواوەکەی ئەو برۆنو شوێنی پێغەمبەرە بەڕێزەکەی ئەو بکەون.

﴿قُلْ إِن كُنتُمْ تُحِبُّونَ اللَّهَ فَاتَّبِعُونِي يُحْبِبْكُمُ اللَّهُ وَيَغْفِرْ لَكُمْ ذُنُوبَكُمْ ۗ وَاللَّهُ غَفُورٌ رَّحِيمٌ (٣١) قُلْ أَطِيعُوا اللَّهَ وَالرَّسُولَ ۖ فَإِن تَوَلَّوْا فَإِنَّ اللَّهَ لَا يُحِبُّ الْكَافِرِينَ (٣٢)﴾

---

[1] القيامة (١٣).

[2] الزخرف (٣٨).

[3] الطبري (٦/٣٠٢).

## خۆشەویستی خودا لە شوێنکەوتنی پێغەمبەرەکەیەتی

ئەم ئایەتە پیرۆزە دادوەری دەکات دەربارەی ئەوانەی کە دەڵێن خودایان خۆش دەوێ، بەڵام لەسەر ئەم ڕێڕەوەی موحەممەد (ﷺ)بەڕێوە ناڕۆن ، دەفەرمووێت کە ئەوانە ڕاست ناڕۆن لەو قسەیەدا دەیکەن هەتا شوێن شەریعەتی موحەممەد (ﷺ) نەکەون کە ئاینی ئەو پێغەمبەرەیە لە گفتارو کردارو گشت هەڵس‌و کەوتێکیاندا، وەك لە فەرموودەی سەحیحا هاتووە لە پێغەمبەری خوداوە (ﷺ) کە دەفەرمووێت: (هەر کەسێ هەر کارێ بکات فەرمانی ئێمەی لەسەر نەبێ ئەو کارە وەرنەگیراوە)[1] هەر بۆیە خودای مەزن دەفەرمووێت: ﴿ قُلْ إِن كُنتُمْ تُحِبُّونَ ٱللَّهَ فَٱتَّبِعُونِى يُحْبِبْكُمُ ٱللَّهُ ﴾ بڵێ: ئێوە ئەگەر خوداتان خۆش دەوێ، شوێنی من کەون هەتا خوداش ئێوەی خۆش بوێ. واتە: زیاتر لەوەتان دەست دەکەوێ، کە خۆشەویستی خودایە بۆتان. حەسەنی بەسری‌و کەسانی تریش لە زانایانی پێشینە دەڵێن: هەندێ کەس وتویانە خودامان خۆش دەوێ، خودای گەورە تاقی کردونەتەوە بەم ئایەتە پیرۆزە کە دەفەرمووێت: ﴿ قُلْ إِن كُنتُمْ تُحِبُّونَ ٱللَّهَ فَٱتَّبِعُونِى يُحْبِبْكُمُ ٱللَّهُ ﴾ ئێوە ئەگەر خواتان خۆش دەوێ، شوێنی من بکەون هەتا خوداش ئێوەی خۆش بوێ.[2] پاشان خودای مەزن دەفەرمووێت: ﴿وَيَغْفِرْ لَكُمْ ذُنُوبَكُمْ ۗ وَٱللَّهُ غَفُورٌ رَّحِيمٌ﴾ لە گوناهیشتان ببورێ‌و دیارە خودا خەتا بەخش‌و دلۆڤانە. واتە: بە شوێن کەوتنی ئەو پێغەمبەرەو (ﷺ) ناردنی ئەو تووشی ئەو هەموو خێرو بەرەکەتە دێن. پاشان خودای مەزن فەرمان دەکات بە هەموو خەڵکی بەبێ جیاوازی‌و دەفەرمووێت: ﴿ قُلْ أَطِيعُوا۟ ٱللَّهَ وَٱلرَّسُولَ ۖ فَإِن تَوَلَّوْا۟ فَإِنَّ ٱللَّهَ لَا يُحِبُّ ٱلْكَـٰفِرِينَ ﴾ بڵێ: دەبێ بەرفەرمانی خوداو پێغەمبەرەکەی بن، جا ئەگەر لە فەرمانی دەرچوون، ئیتر خوانەناسانی خۆش ناوێ. ئەم ئایەتە بەڵگەیە لەسەر ئەوە کە لادان لە ڕێگەی ئەو خوانەناسیە، خودایش ڕەوشتی خوانەناسی خۆش ناوێ، هەرچەندە ئەو کەسە وابزانێ کە خودای خۆش دەوێ‌و لێی نزیك دەبێتەوە. هەتا شوێنی ئەو پێغەمبەرە نەخوێندەوارە کە دوایین پێغەمبەرەو (ﷺ) ڕەوانە کراوی خودایە بۆ مرۆڤو جنۆکە نەکەوێ. کە گشت پێغەمبەران، بە پێغەمبەرە مورسەلەکانیشەوە لە زەمانی ئەوا بوونایە دەبوو شوێنی بکەون‌و گوێڕایەڵی فەرمانیان بکردایەو شوێنی شەریعەتەکەی بکەوتنایە. وەك بەو زوانە ئەو باسە دێت لەم ئایەتەدا کە خودای گەورە دەفەرمووێت: ﴿وَإِذْ أَخَذَ ٱللَّهُ مِيثَـٰقَ ٱلنَّبِيِّـۧنَ ﴾[3] (بێنەوە بیر) ئەو کاتە خودا پەیمانی بەست لەگەڵ پێغەمبەراندا.

---

[1] فتح الباري (٥/٣٥٥).

[2] إبن أبي حاتم (٢/٢٠٥).

[3] آل عمران (٨١).

﴿إِنَّ ٱللَّهَ ٱصۡطَفَىٰٓ ءَادَمَ وَنُوحٗا وَءَالَ إِبۡرَٰهِيمَ وَءَالَ عِمۡرَٰنَ عَلَى ٱلۡعَٰلَمِينَ ﴿٣٣﴾ ذُرِّيَّةَۢ بَعۡضُهَا مِنۢ بَعۡضٖۗ وَٱللَّهُ سَمِيعٌ عَلِيمٌ ﴿٣٤﴾﴾

### هەڵبژاردەکان لە خەڵکی سەر زەمین

﴿ٱللَّهَ ٱصۡطَفَىٰٓ ءَادَمَ وَنُوحٗا وَءَالَ إِبۡرَٰهِيمَ وَءَالَ عِمۡرَٰنَ عَلَى ٱلۡعَٰلَمِينَ ﴿٣٣﴾ ذُرِّيَّةَۢ بَعۡضُهَا مِنۢ بَعۡضٖۗ وَٱللَّهُ سَمِيعٌ عَلِيمٌ﴾ ئادەمو نووحو نەتەوەی ئیبراهیمو نەوەی عیمران. لەلایەن خوداوە لەناو خەڵکی هەموو جیهان هەڵبژاردەن، خودا زیاتر ڕێزی لەوان نا. هەموو لایان سەر بەیەکنو خودا بیسەرو ئاگادارە. خودای مەزن باسی ئەوە دەکات کە ئەم پێغەمبەریەتیەی لەناو خەڵکی هەموو جیهاندا هەڵبژاردووە. سەرەتا ئادەمی هەڵبژاردووە (سەلامی خوای لێ بێ)، بە دەستی خۆی دروستی کردوە. لە گیانی خۆشی کردوە بە بەریداو فریشتەکان سوژدەیان بۆ بردوەو ناوی هەموو شتێکی فێر کردووە. لە بەهەشتیش نیشتەجێی کردوە، پاشان لە بەهەشت دایبەزاندوە، لەبەر لەکارزانیەك کە خۆی دەیزانێ. نووحیشی هەڵبژاردووە (سەلامی خوای لێ بێ) کردوویەتی بە یەکەمین ڕاسپاردەی خۆی لەسەر زەمیندا، کاتێ کە خەڵکی دەستیان دایە بتپەرستیو شەریکیان بۆ خودا دانا بێ ئەوەی هیچ بەڵگەیەکیان بە دەستەوە بێ. دوای ئەوە کە ماوەیەکی زۆر بەردەوام بوون لەسەر بتپەرستی، خودا تۆڵەی لە هۆزەکەی بۆ سەندەوە کە بە شەوو بە ڕۆژو بە نهێنیو بە ئاشکرا بانگی دەکردن کە واز لە بتپەرستی بێنن، بەڵام ئەوان زیاتر سوور بوون لەسەر بت پەرستیو لە نووح پێغەمبەر (سەلامی خوای لێ بێ) هەر دووردەکەوتنەوە، نووحیش دوعای لێ کردن، خودایش هەموویانی نوقمی ئاو کردنو خنکاندنی. هیچ کەسیان لێ ڕزگار نەبوو جگە لەوانەی شوێنی ئەو ئاینە کەوتبوون کە ئەو بۆی هێنابوون. ئالی ئیبراهیمیشی هەڵبژارد لەوانە گەورەترین کەس لەناو مرۆڤداو دوایین پێغەمبەر کە موحەممەدە (ﷺ) هەروەها ئالی عیمران. مەبەست بەم عیمرانە باوکی مەریەمی دایکی عیسا(سەلامی خوای لێ بێ) چونکە عیسا لە نەوەی ئیبراهیمە (سەلامی خوایان لێ بێ) وەك لە سورەتی ئەنعامدا خوا مەیلی لێ بێ باس دەکرێن.

﴿إِذۡ قَالَتِ ٱمۡرَأَتُ عِمۡرَٰنَ رَبِّ إِنِّي نَذَرۡتُ لَكَ مَا فِي بَطۡنِي مُحَرَّرٗا فَتَقَبَّلۡ مِنِّيٓۖ إِنَّكَ أَنتَ ٱلسَّمِيعُ ٱلۡعَلِيمُ ﴿٣٥﴾ فَلَمَّا وَضَعَتۡهَا قَالَتۡ رَبِّ إِنِّي وَضَعۡتُهَآ أُنثَىٰ وَٱللَّهُ أَعۡلَمُ بِمَا وَضَعَتۡ وَلَيۡسَ ٱلذَّكَرُ كَٱلۡأُنثَىٰۖ وَإِنِّي سَمَّيۡتُهَا مَرۡيَمَ وَإِنِّيٓ أُعِيذُهَا بِكَ وَذُرِّيَّتَهَا مِنَ ٱلشَّيۡطَٰنِ ٱلرَّجِيمِ ﴿٣٦﴾﴾

### بەسەرهاتی لەدایك بوونی مەریەم

ئەم ژنی عیمرانە دایکی مەریەم (سەلامی خوای لێ بێ) ناوی حەننەی کچی فاقوزە. موحەممەدی کوڕی ئیسحاق وتی: دایکی مەریەم ژنێك بوو منداڵی نەدەبوو. ڕۆژێ باڵندەیەکی بینی بە دەنوکی

خواردنی ئەدا بە بێچوەکەی، حەزی لە مندالّ کرد، پاڕایەوە لە خودا کە مندالّێکی خەلاّت بکات، خودای مەزن داواکەی لیّ وەرگرت. هاوسەرەکەی سەرجێی لەگەلا کرد سکی بوو، کە زانی سکی بووە نەزری کرد کە ئازادی بکا. واتە: هەمیشە خەریکی خواناسی بێتو خزمەتی قودسی پیرۆز بکات. وەك خودای مەزن دەفەرموێت: ﴿إِذْ قَالَتِ ٱمْرَأَتُ عِمْرَٰنَ رَبِّ إِنِّى نَذَرْتُ لَكَ مَا فِى بَطْنِى مُحَرَّرًا فَتَقَبَّلْ مِنِّىٓ إِنَّكَ أَنتَ ٱلسَّمِيعُ ٱلْعَلِيمُ﴾ کاتیّ کە ژنەکەی عیمران وتی: ئەی پەروەردگاری من ئەو مندالّەی کەوتۆتە سکی منەوە، من نەزری تۆی دەکەم، بەهیوام لێم قبوولّ بکەی، بیسەرو ئاگادار هەر تۆی. واتە: تۆ لالّەکەم دەبیسیو ئاگات لە نیەتمە، لەو کاتەدا نەی دەزانی چی لەناو سکی دایە: نێرە یان میّ یە؟ پاشان خودای مەزن دەفەرموێت: ﴿فَلَمَّا وَضَعَتْهَا قَالَتْ رَبِّ إِنِّى وَضَعْتُهَآ أُنثَىٰ وَٱللَّهُ أَعْلَمُ بِمَا وَضَعَتْ وَلَيْسَ ٱلذَّكَرُ كَٱلْأُنثَىٰ﴾ ئەوسا کە بارەکەی دانا، وتی: ئەی پەروەردگاری من، ئەوا من مێینەم بووە (خودایش چاکتر ئاگادارە لەوەی بوومە) دیار کچیش وەك کوڕ نیە. واتە: لە هێزو تواناادا بۆ خواپەرستیو خزمەتکردنی قودسی پیرۆز ﴿وَإِنِّى سَمَّيْتُهَا مَرْيَمَ﴾ من ناوم لیّ ناوە مەریەم. ئەم ئایەتە بەلّگەیە لەسەر دروستی ناونان لە ڕۆژی لەدایك بووندا. وەك لە دەقەکەوە دیارەو شەرعی پێش خۆشمانەو فەرموودەیش لە بارەیەوە هاتووە کە پێغەمبەری خودا (ﷺ) فەرموویەتی: (ئەمشەو من مندالّێکم لەدایك بووە، ناوم نا بە ناوی باوکمەوە ئیبراهیم) لە هەردوو سەحیحەکەدا هاتووە. دیسان لە هەردوو سەحیحەکەدا هاتووە.[1] کە ئەنەسی کوڕی مالیك براکەی بردوە بۆ لای پێغەمبەر (ﷺ) کاتیّ کە دایکی بووی (بە خورمایەك دەمی شیرین کردوەو ناوی ناوە عەبدوللا)[2] هەر بەو شێوەیە ناوی مندالّی تریش نراوە لە ڕۆژی لەدایك بونیدا. بەلاّم فەرموودەکەی لە حەسەنی بەسریەوە لە سەمورەی کوڕی جوندەبەوە، کە پێغەمبەری خودا (ﷺ) فەرموویەتی: (هەموو مندالّیّ (کە لەدایك دەبیّ) بارمتەی (عەقیقەکەیەتی) لە ڕۆژی حەوتەمدا بۆی سەردەبڕیّو ناودەنرێتو سەریشی دەتاشریّ) ئیمامی ئەحمەدو زانایانی تری فەرموودەیش هێناویانە[3] تیرمیزی بە سەحیحی داناوە. خودای مەزن باسی مەریەم دەکات کە وتویەتی: ﴿وَإِنِّىٓ أُعِيذُهَا بِكَ وَذُرِّيَّتَهَا مِنَ ٱلشَّيْطَٰنِ ٱلرَّجِيمِ﴾ مەریەمو نەوەکەیشی کە عیسایە سپارد بە خودای مەزن لە شەڕی شەیتان، خودایش داواکەی لیّ وەرگرت. وەك عەبدوڕەزاق ڕیوایەتی کردوە لە

---

[1] فتح الباري (٣٠٦/٣)، مسلم (١٨٠٧/٤).

[2] فتح الباري (٥٠١/٩).

[3] أحمد (٧/٥)، أبوداود (٢٥٩/٣)، تحفة الاحوذي (١١٥/٥)، النسائي (١٦٦/٧)، إبن ماجة (١٠٥٧/٢)، فەرموودەیەکی حەسەنە.

ئەبوهورەیرەوە وتی: پێغەمبەری خودا (ﷺ) فەرموویەتی: (هیچ منداڵێك لەدایك نابێ مەگین شەیتان دەستی لێ دەوەشێنێ (مَسُّهُ) كاتێ لە دایك دەبێت. لە سەرەتاوە هاوار دەكات جگە لە مەریەمو كوڕەكەی) پاشان ئەبوهورەیرە دەڵێ: ئەگەر حەز دەكەن ئەم ئایەتە بخوێنن كە خودای مەزن دەفەرموێت: ﴿وَإِنِّيٓ أُعِيذُهَا بِكَ وَذُرِّيَّتَهَا مِنَ ٱلشَّيۡطَٰنِ ٱلرَّجِيمِ ﴾[1] ئەوا ئەویش‌و نەوەكەیشم بە تۆ سپارد كە لە شەیتانی نەفرین لێكراو بیانپارێزی.

﴿ فَتَقَبَّلَهَا رَبُّهَا بِقَبُولٍ حَسَنٖ وَأَنۢبَتَهَا نَبَاتًا حَسَنٗا وَكَفَّلَهَا زَكَرِيَّاۖ كُلَّمَا دَخَلَ عَلَيۡهَا زَكَرِيَّا ٱلۡمِحۡرَابَ وَجَدَ عِندَهَا رِزۡقٗاۖ قَالَ يَٰمَرۡيَمُ أَنَّىٰ لَكِ هَٰذَاۖ قَالَتۡ هُوَ مِنۡ عِندِ ٱللَّهِۖ إِنَّ ٱللَّهَ يَرۡزُقُ مَن يَشَآءُ بِغَيۡرِ حِسَابٍ ﴿٣٧﴾ ﴾

**وەبارهێنانی مەریەم‌و ڕێزو قەدری لەلای خودا**

خودای مەزن باسی ئەوە دەكات كە نەزرەكەی لە دایكی مەریەم قبووڵ كردووەو دەفەرموێت: ﴿ فَتَقَبَّلَهَا رَبُّهَا بِقَبُولٍ حَسَنٖ وَأَنۢبَتَهَا نَبَاتًا حَسَنٗا ﴾ پەروەردگاری ئەو پێشكەشەی (نەزرەی) زۆر بە چاكی لێ وەرگرت. زۆر باش باریهێنا (بەخێوی كرد) و هۆكاری پەروەردەكردنەكەی بۆ ئاسان كرد. لە نزیك پیاوچاكان داینا هەتا فێری چاكەو زانست‌و ئاین ببێت. ﴿وَكَفَّلَهَا زَكَرِيَّا﴾ زەكەریای بۆ سەرپەرشتی ئەو دانا. هەر بۆیە خودا زەكەریای كردە سەرپەرشتی كەری مەریەم، تا بەختەوەری بكات‌و لە زەكەریاوە فێری زانیاریەكی بەسوودو ئاكاری چاك ببێ. چونكە زەكەریا هاوسەری پووری بوو. وەك ئیبنوئیسحاق‌و ئیبنوجەریرو كەسانی تریش باسیان كردووە، وتراوە: هاوسەری خوشكی بووە. وەك لە فەرموودەی سەحیحا هاتووە: (لەو كاتەدا یەحیاو عیسا (سەلامی خوایان لێ بێ) كوڕی پووری یەكتری بوون)[2] ئەوەی كە ئیبنوئیسحاق وتویەتی قسەی زۆری لەسەرە. بەپێی ئەم فەرموودەیە لەژێر سەرپەرشتی پووریا بووە. لە هەردوو سەحیحەكەدا هاتووە كە پێغەمبەری خودا (ﷺ) فەرمانی دا دەربارەی عەمارەی كچی حەمزەی (حاص) كە لە ژێر سەرپەرشتی خێزانی جەعفەری كوڕی ئەبوتالیبدا بێت‌و فەرمووی: (پوور لە جێی دایكایە)[3] پاشان خودای گەورە باسی بەڕێزی‌و لێبڕاوی مەریەم دەكات لە شوێنی خواپەرستیەكەیداو دەفەرموێت: ﴿كُلَّمَا دَخَلَ عَلَيۡهَا زَكَرِيَّا ٱلۡمِحۡرَابَ وَجَدَ عِندَهَا رِزۡقٗا﴾ هەموو جارێ كە زەكەریا بڕۆشتایە بۆ لای مەریەم لە شوێنی خواپەرستیەكەیدا. بژێوی لەلای ئەبینی. موجاهیدو عیكرمەو سەعیدی كوڕی جوبەیرو ئەبوشەعساءو

---

[1] عبدالرزاق (١١٩/١).

[2] فتح الباري (٥٣٩/٦).

[3] فتح الباري (٥٧١/٧).

(الشعثاء) ئیبراهیمی نەخەعیو زەححاکو قەتادەو ڕەبیعی کوڕی ئەنەسو عەتیەی عەوفیو سوودی دەڵێن: واتە: میوەی هاوینیان لە لا دەبینی لە زستانداو میوەی زستانیان لە هاویندا دەبینی.[1] کاتێ زەکەریا ئەوەی دی لە لای ﴿قَالَ يَٰمَرْيَمُ أَنَّىٰ لَكِ هَٰذَا﴾ وتی: مەریەم تۆ ئەم بژێویەت لە کوێ بوو؟ ﴿قَالَتْ هُوَ مِنْ عِندِ ٱللَّهِ إِنَّ ٱللَّهَ يَرْزُقُ مَن يَشَآءُ بِغَيْرِ حِسَابٍ﴾ وتی: لەلایەن خوداوە بۆم هاتووە، خودا مەیلی لێ بێ بۆ هەرکەسێ ڕۆزی بێ هژمار دەنێرێ.

﴿هُنَالِكَ دَعَا زَكَرِيَّا رَبَّهُۥ قَالَ رَبِّ هَبْ لِى مِن لَّدُنكَ ذُرِّيَّةً طَيِّبَةً إِنَّكَ سَمِيعُ ٱلدُّعَآءِ ﴿٣٨﴾ فَنَادَتْهُ ٱلْمَلَٰٓئِكَةُ وَهُوَ قَآئِمٌ يُصَلِّى فِى ٱلْمِحْرَابِ أَنَّ ٱللَّهَ يُبَشِّرُكَ بِيَحْيَىٰ مُصَدِّقًۢا بِكَلِمَةٍ مِّنَ ٱللَّهِ وَسَيِّدًا وَحَصُورًا وَنَبِيًّا مِّنَ ٱلصَّٰلِحِينَ ﴿٣٩﴾ قَالَ رَبِّ أَنَّىٰ يَكُونُ لِى غُلَٰمٌ وَقَدْ بَلَغَنِىَ ٱلْكِبَرُ وَٱمْرَأَتِى عَاقِرٌ قَالَ كَذَٰلِكَ ٱللَّهُ يَفْعَلُ مَا يَشَآءُ ﴿٤٠﴾ قَالَ رَبِّ ٱجْعَل لِّىٓ ءَايَةً قَالَ ءَايَتُكَ أَلَّا تُكَلِّمَ ٱلنَّاسَ ثَلَٰثَةَ أَيَّامٍ إِلَّا رَمْزًا وَٱذْكُر رَّبَّكَ كَثِيرًا وَسَبِّحْ بِٱلْعَشِىِّ وَٱلْإِبْكَٰرِ ﴿٤١﴾﴾

## دوعای زەکەریاو مژدە پێدانی بە یەحیا

کاتێ کە زەکەریا (سەلامی خوای لێ بێ) بینی خودا ڕۆزی مەریەم ئەدا، میوەی زستانی پێئەدا لە هاویندا میوەی هاوینیشی لە زستاندا بۆ دەنێرێ. لەو کاتەدا ئارەزووی منداڵی کرد، پیاوێکی گەورەی بەتەمەن بوو ئێسکی بەرەو لاوازی دەچوو، سەریشی سپی بوو بوو، هاوسەرەکەیشی تەمەنی زۆر بوو منداڵی نەدەبوو. لەگەڵ ئەوەیشا هەموو داوای لە پەروەردگاری کردو بە نزمیو لەسەرخۆ هاواری لێکرد وەك خودای مەزن دەفەرموێت: ﴿هُنَالِكَ دَعَا زَكَرِيَّا رَبَّهُۥ قَالَ رَبِّ هَبْ لِى مِن لَّدُنكَ ذُرِّيَّةً طَيِّبَةً إِنَّكَ سَمِيعُ ٱلدُّعَآءِ﴾ هەر لەوێدا زەکەرییا بانگی پەروەردگاری کرد وتی: ئەی پەروەردگارم منداڵێکی پاکو چاکم پێ ببەخشە. دەزانم تۆ پاڕانەوەی من دەبیسی. خودای گەورە دەفەرموێت: ﴿فَنَادَتْهُ ٱلْمَلَٰٓئِكَةُ وَهُوَ قَآئِمٌ يُصَلِّى فِى ٱلْمِحْرَابِ﴾ لەکاتێکدا کە لەناو میحرابەکەدا نوێژی دەکرد فریشتەی ئێمە بانگی کرد: واتە: فریشتە قسەی لەگەڵا کرد  بە شێوەیەك کە گوێی لێ بوو. کاتێ لە میحرابەکەیدا نوێژی دەکرد کە شوێنی خەڵوەتو نوێژو پاڕانەوەی بوو. پاشان خودای مەزن باسی مژدەی فریشتە دەکات پێی بە یەحیا ﴿أَنَّ ٱللَّهَ يُبَشِّرُكَ بِيَحْيَىٰ﴾ خودا مزگێنیت پێدەدا کوڕێکت بە ناوی یەحیا دەبێ. واتە: منداڵێکت پێ دەبەخشێ لە پشتی خۆت ناوی یەحیایە. قەتادەو کەسانی تریش وتویانە: بۆیە

[1] إبن أبي حاتم (٢/٢٢٧-٢٢٩).

ناونراوە بە یەحیا چونکە خودا بە بڕواوە بوژاندویەتەوە[1]. ﴿مُصَدِّقًۢا بِكَلِمَةٍ مِّنَ ٱللَّهِ﴾ کە هەموو فەرموودەی خودا دەسەلمێنێ. عەوفیو کەسانی تریش ڕیوایەتیان کردوە لە ئیبنوعەبباسەوەو حەسەنو قەتادەو عیکرمەو موجاهیدو ئەبوشەعساءو سوودیو زەحاکو کەسانی تریش وتویانە ئەم ئایەتە: ﴿مُصَدِّقًۢا بِكَلِمَةٍ مِّنَ ٱللَّهِ﴾ کە هەموو فەرموودەی خودا بە ڕاست دەزانێ. واتە: بڕوای بە عیسای کوڕی مەریەم هەیە[2]. ﴿وَسَيِّدًا﴾ بەڕێزو پێشەوایە. ئەبولعالیەو ڕەبیعی کوڕی ئەنەسو زەحاکو کەسانی تریش وتویانە: لەکارزانە[3] ئیبنوعەبباسو سەوریو زەحاک وتیان: پێشەواو لە کارزانو لەخواترسە.[4] سەعیدی کوڕی موسەییب وتی: ئەو زانایەکی تێگەیشتوو بووە. عەتیە وتی: پێشەوا بووە لە ڕەوشتو ئاینیا. عیکرمە وتی: ئەو کەسێ بووە توڕەیی بەسەریدا زاڵ نەبووە. ئیبنوزەید وتی: ئەو زۆر بەڕێز بووە. موجاهیدو کەسانی تریش دەڵێن: ئەو زۆر بەڕێز بووە لە لای خودا. ﴿وَحَصُورًا﴾ خۆڕاگرە (لە ژن) واتە: ئەمە لێرەدا مانای ئەوە نیە توانای ژن هێنانی نیە. بەڵکو مانای ئەوەیە پارێزراوە لە شورەییو شتی پیس، ئەوە نابێتە هۆی ئەوە ژن نەهێنێو توانای ژن هێنانی نەبێ. بەڵام لە دوعاکەی زەکەریاوە دەردەکەوێ داوای منداڵێکی کردوە بۆ ئەوەی لە دوای خۆی بەجێ بمێنێ. وەك خودای مەزن دەفەرموێت: ﴿هَبْ لِى مِن لَّدُنكَ ذُرِّيَّةً طَيِّبَةً﴾ منداڵێکی چاکو پاکم پێ ببەخشە. پاکیو بێ عەیبی هەر بۆ خودایەو ئەو باشتر دەزانێ. ﴿وَنَبِيًّا مِّنَ ٱلصَّـٰلِحِينَ﴾ یەکێك لە پێغەمبەرە چاکەکان دەبێ. ئەمە مژدەی دووهەمە بە پێغەمبەریەتی یەحیا دوای مژدەدان بۆ بە لەدایك بوونی. کە لە یەکەم زۆر مەزنترە. وەك خودای مەزن فەرموویەتی بە دایکی مووسا: ﴿إِنَّا رَآدُّوهُ إِلَيْكِ وَجَاعِلُوهُ مِنَ ٱلْمُرْسَلِينَ﴾[5] ئێمە ئەومان گەڕاندەوە بۆتو کردمان بە یەکێ لە پێغەمبەرە ڕاسپاردەکان. کاتێ کە زەکەریا ئەو مژدەی بۆ هاتە جێ، زۆر بە لایەوە سەیر بوو کە لەو تەمەنە مەزنە زۆرەدا منداڵی ببێ. ﴿قَالَ رَبِّ أَنَّىٰ يَكُونُ لِى غُلَـٰمٌ وَقَدْ بَلَغَنِىَ ٱلْكِبَرُ وَٱمْرَأَتِى عَاقِرٌ قَالَ كَذَٰلِكَ ٱللَّهُ يَفْعَلُ مَا يَشَآءُ﴾ وتی: ئەی پەروەردگاری من، جا چۆن من کوڕم دەبێ، منی وا پیرو کەم تواناو ژنەکەشم نەزۆکە؟

---

[1] إبن أبي حاتم (٢/٢٣٥).

[2] إبن أبي حاتم (٢/٢٣٥-٢٣٧).

[3] إبن أبي حاتم (٢/٢٣٨).

[4] الطبري (٦/٣٧٥-٣٧٦).

[5] القصص (٧).

(فریشتەکان) وتیان: خودا چی ئارەزوو بێ وادەکات. ئەوە فەرمانی خودای مەزنەو هیچ شتێ نابێتە ڕێگرو بەربەست لە بڕیاریدا. هەموو شتێ بە لایەوە ئاسانە. ﴿قَالَ رَبِّ ٱجْعَل لِّيٓ ءَايَةً﴾ وتی: ئەی پەروەردگاری من خۆت نیشانەیەکەم بۆ دیاری بکە. کە ببێتە بەڵگە لەسەر ئەوە کە من منداڵم دەبێ. ﴿قَالَ ءَايَتُكَ أَلَّا تُكَلِّمَ ٱلنَّاسَ ثَلَٰثَةَ أَيَّامٍ إِلَّا رَمْزًا﴾ فەرمووی: نیشانە ئەوەیە کە تۆ هەتا سێ ڕۆژ ناتوانی مەردم بدوێنی. مەگین بە ئیشارەت. واتە: ناتوانی قسە لەگەڵ خەڵکا بکەی، وە هیچ کەم و کوڕیەکیشی لە تەندروستیدا نیە. وەك لە ئایەتێکی تردا خودای مەزن دەفەرموێت: ﴿ثَلَٰثَ لَيَالٍ سَوِيًّا﴾[1] تا سێ شەو قسە لەگەڵ مەردم ناکەی. پاشان خودا فەرمانی پێدەکات کە زۆر یادی بکات و بەردەوام سوپاس گوزارو لە پەسەنی خودا نەوەستێ ﴿وَٱذْكُر رَّبَّكَ كَثِيرًا وَسَبِّحْ بِٱلْعَشِيِّ وَٱلْإِبْكَٰرِ﴾ لە ئێوارەو بەیانانادا زۆر یادی پەروەردگارت بکەو لە پەسەندانی مەوەستە. لە سەرەتای سورەتی مەریەمدا ئەم باسە بە تەواوی دێت بە یارمەتی خودای گەورە.

﴿وَإِذْ قَالَتِ ٱلْمَلَٰٓئِكَةُ يَٰمَرْيَمُ إِنَّ ٱللَّهَ ٱصْطَفَىٰكِ وَطَهَّرَكِ وَٱصْطَفَىٰكِ عَلَىٰ نِسَآءِ ٱلْعَٰلَمِينَ ﴿٤٢﴾ يَٰمَرْيَمُ ٱقْنُتِى لِرَبِّكِ وَٱسْجُدِى وَٱرْكَعِى مَعَ ٱلرَّٰكِعِينَ ﴿٤٣﴾ ذَٰلِكَ مِنْ أَنۢبَآءِ ٱلْغَيْبِ نُوحِيهِ إِلَيْكَ وَمَا كُنتَ لَدَيْهِمْ إِذْ يُلْقُونَ أَقْلَٰمَهُمْ أَيُّهُمْ يَكْفُلُ مَرْيَمَ وَمَا كُنتَ لَدَيْهِمْ إِذْ يَخْتَصِمُونَ ﴿٤٤﴾﴾

## ڕێزی مەریەم بەسەر ژنانی چەرخی خۆیدا

﴿وَإِذْ قَالَتِ ٱلْمَلَٰٓئِكَةُ يَٰمَرْيَمُ إِنَّ ٱللَّهَ ٱصْطَفَىٰكِ وَطَهَّرَكِ وَٱصْطَفَىٰكِ عَلَىٰ نِسَآءِ ٱلْعَٰلَمِينَ﴾ لەو کاتەدا فریشتە بە مەریەمی وت: خودا تۆی هەڵبژاردوەو پاكو خاوێنی ڕاگرتوی، تۆی لە چاو ژنانی دنیا بەڕێزتر گرت. لێرەدا خودای مەزن باسی فریشتە دەکات کە قسەیان لەگەڵ مەریەم کرد (سەلامی خوای لێ بێ) دەربارەی ئەو ڕێزەی کە لێی ناوەو هەڵیبژاردووە، لەبەر عیبادەتی زۆرو دنیا نەویستی و پاکیی و خاوێنی لە هەموو پەژارەو کەسەرێ و ڕێز لێنانێ جار لە دوای جار بەسەر هەموو ژنانی دنیادا. هیشامی کوڕی عروە ڕیوایەتی کردوە لە عەلی کوڕی ئەبوتالیبەوە (ڕەزای خوای لێ بێ) وتی: بیستم لە پێغەمبەری خوداوە (ﷺ) ئەیفەرموو: (چاکترین ژنانی (چەرخی خۆی) مەریەمی کچی عیمرانە،چاکترین ژنانی (چەرخی خۆی) خەدیجەی کچی خوەیلدە))[2] لە هەردوو سەحیحەکەیشدا ئەم

---

[1] مریم (١٠).

[2] تحفة الاحوذي (٣٨٨/١٠)، سەحیحە.

فەرموودەیە هاتووە[1] ئیبنوجەریر ڕیوایەتی کردوە لە ئەبوموسای ئەشعەریەوە، وتی: پێغەمبەری خودا (ﷺ) فەرموویەتی: (پیاوان زۆریان تەواو بوون، بەڵام ئافرەتان کامڵیان تیا نەبووە جگە لە مەریەمی کچی عیمران‌و ئاسیەی خێزانی فیرعەون).[2] زانایانی فەرموودە هەموو هێناویانە جگە لە ئەبوداود[3] باسی ڕێگاکانی ئەم فەرموودەیەو وتەکانیم کردوە لە بەسەرهاتی عیسای کوڕی مەریەمدا (سەلامی خوایان لێ بێ) لەم کتێبەماندا (البداية و النهاية) سوپاس‌و ستایش بۆ خودای مەزن. پاشان خودای مەزن باسی ئەو فریشتانە دەکات کە فەرمانیان کردوە بە مەریەم کە زۆر یادی خودا بکات، بە ملکەچی‌و خۆ بەکەم زانینەوە ڕکوع‌و سوژدە ببا بۆ خوداو بەردەوام بێت لەسەری. لەبەر ئەو بڕیارەی خودا کە داویەتی بەسەریدا کە تاقیکردنەوەیەکە بۆی‌و تووشی دێت، ڕێزی لێ ناوە لە دنیاو لە قیامەتدا، کە خودای گەورە تواناو دەستەڵاتی خۆی تیا دەرخستووە کە منداڵێکی وەدی هێناوە لەو بەبێ باوك‌و دەفەرمووێت: ﴿ يَٰمَرۡيَمُ ٱقۡنُتِي لِرَبِّكِ وَٱسۡجُدِي وَٱرۡكَعِي مَعَ ٱلرَّٰكِعِينَ ﴾ ئەی مەریەم، تۆ لە فەرمانی پەروەردگاری خۆت دەرمەچۆ، بۆی بچۆرە سەر سوژدەوەو تۆش لەگەڵ کڕنووش بەراندا کڕنووش بەرە. (القنوت) واتە: خواپەرستی بە ملکەچیەوە. وەك خودای مەزن دەفەرمووێت: ﴿بَل لَّهُۥ مَا فِي ٱلسَّمَٰوَٰتِ وَٱلۡأَرۡضِۖ كُلّٞ لَّهُۥ قَٰنِتُونَ﴾[4] بێگومان ئەوەی لە ئاسمانەکان‌و زەمیندایە هی ئەوەو هەموو بە فەرمانی ئەو دەڕۆن. دوای ئەوە خودای گەورە پێغەمبەری (ﷺ) ئاگادار کرد لە مەزنی ئەو کارە دەفەرمووێت: ﴿ ذَٰلِكَ مِنۡ أَنۢبَآءِ ٱلۡغَيۡبِ نُوحِيهِ إِلَيۡكَۚ وَمَا كُنتَ لَدَيۡهِمۡ إِذۡ يُلۡقُونَ أَقۡلَٰمَهُمۡ أَيُّهُمۡ يَكۡفُلُ مَرۡيَمَ وَمَا كُنتَ لَدَيۡهِمۡ إِذۡ يَخۡتَصِمُونَ ﴾ ئەمە لەو دەنگو باسەیە کە تۆ ئاگات لێیان نەبوەو ئێمە دەیخەینە دڵتەوە، هەروەها تۆ لەوێ نەبووی کە قەڵەمیان تووڕ هەڵدەدا کێ سەرپەرشتی مەریەم بێ، ئەو کاتەش لەناو خۆیاندا کێشەیان کرد. تۆ لەناویاندا نەبووی. واتە: تۆ ئەی موحەممەد (ﷺ) لەناویاندا نەبووی‌و بە چاوی خۆت ببینی‌و بۆیان باس بکەی. بەڵکو خودا تۆی لەوە ئاگادار کردوە، وەك ئەوەی خۆت لەوێ بوبی‌و ئاگات لەو کارەیان بێ کاتێ کە قەڵەمیان فڕێدا لەبارەی مەریەمەوە کە لەلای کامیان بێت‌و سەرپەرشتی بکات. لەبەر ئەوەی تووشی خێرو پاداشت بن. ئیبنوجەریر ڕیوایەتی

---

[1] فتح الباري (٥٤٢/٦)، مسلم (١٨٨٦/٤).

[2] الطبري (٣٩٧/٦).

[3] فتح الباري (٥٤٣/٦)، مسلم (١٨٨٦/٤)، تحفة الاحوذي (٥٦٣/٥)، النسائي في الكبرى (٩٣/٥)، إبن ماجة (١٠٩١/٢).

[4] البقرة (١١٦).

کردوە لە عیکرمەوە، وتی: دایکی مەریەم. مەریەمی هەڵگرتو بردی بۆ لای بەنیلکاهنی (بني الكاهن) کوڕی هاروون برای مووسا (سەلامی خوایان لێ بێ) وتی: ئەوان لەو کاتەدا سەرپەرشتی قودسی پیرۆزیان دەکرد، وەك چۆن ئەوسا بنەماڵەیەك سەرپەرشتی کەعبەی پیرۆزی دەکرد. دایکی مەریەم پێی وتن: من ئەم منداڵەم نەزر کردوەو ئازادم کردوە کچی خۆمە. ژنێ کە لە سوڕی مانگانەدا بێ (حائض) نایەتە ناو کلیسا وە من نایبەمەوە بۆ ماڵی خۆم. ئەوانیش وتیان: ئەمە کچی پێشەواکەمانە. ئەوسا عیمران پێش نوێژی بۆ دەکردن‌و خاوەنی قوربانیەکان بوو. زەکەریبیا وتی: بیدەن بە من چونکە من هاوسەری پوری ئەوم. وتیان: نەخێر، دڵمان پێی خۆش‌و ئارام دەبێ، ئەو کچی پێشەوامانە، کاتێ کە قەڵەمیان بۆ فڕیدا، ئەو قەڵەمەی کە تەوراتیان پێ دەنوسیەوە، زەکەریبیا لێی بردنەوەو سەرپەرشتی کردنی مەریەم کەوتە دەستی ئەو.[1] جارێکی تریش عیکرمە هەر باسی کردوە[2] سوودی‌و قەتادەو ڕەبیعی کوڕی ئەنەس‌و کەسانی تریش هەر وتویانە[3] قسەکانیان تێکەڵی یەکتری بووە، دەڵێن: چوون بۆ لای ڕووباری ئەردەن، بڕیاریان دا کە لەوێ قەڵەمەکانیان بهاوێژن، هەرکامیان لەسەر ئاوەکە بۆی وەستا، ئەو کەسە سەرپەرشتی بکات، قەڵەمەکانیان فڕێدا، ئەوەکە هەڵی گرت جگە لە قەڵەمەکەی زەکەریبیا وەستاو جێگیر بوو. دەڵێن: قەڵەمەکەی زەکەریا ڕۆشت‌و بەرز دەبوەوەو ئاوە ڕۆشتوەکەی لەت دەکرد. لەگەڵ ئەوەیشدا زەکەریبیا زۆر بەڕێزو قەدرو زانا بوو لە ناویانداو پێشەواو پێغەمبەریشیان بوو (سەلامی خودا لە زەکەریبیاو گشت پێغەمبەرەکانی تریش بێت).

﴿ إِذْ قَالَتِ ٱلْمَلَـٰٓئِكَةُ يَـٰمَرْيَمُ إِنَّ ٱللَّهَ يُبَشِّرُكِ بِكَلِمَةٍ مِّنْهُ ٱسْمُهُ ٱلْمَسِيحُ عِيسَى ٱبْنُ مَرْيَمَ وَجِيهًا فِى ٱلدُّنْيَا وَٱلْـَٔاخِرَةِ وَمِنَ ٱلْمُقَرَّبِينَ ﴿٤٥﴾ وَيُكَلِّمُ ٱلنَّاسَ فِى ٱلْمَهْدِ وَكَهْلًا وَمِنَ ٱلصَّـٰلِحِينَ ﴿٤٦﴾ قَالَتْ رَبِّ أَنَّىٰ يَكُونُ لِى وَلَدٌ وَلَمْ يَمْسَسْنِى بَشَرٌ قَالَ كَذَٰلِكِ ٱللَّهُ يَخْلُقُ مَا يَشَآءُ إِذَا قَضَىٰٓ أَمْرًا فَإِنَّمَا يَقُولُ لَهُۥ كُن فَيَكُونُ ﴿٤٧﴾ ﴾

### مژدەدان بە مەریەمی ڕاستگۆ بە عیسا (سەلامی خوایان لێ بێ)

ئەمە مژدەیەکە لە فریشتەوە بۆ مەریەم (سەلامی خوای لێ بێ) کە بەو زوانە منداڵێکی زۆر بەڕێزو خاوەن پایە دەبێ، ﴿ إِذْ قَالَتِ ٱلْمَلَـٰٓئِكَةُ يَـٰمَرْيَمُ إِنَّ ٱللَّهَ يُبَشِّرُكِ بِكَلِمَةٍ مِّنْهُ ﴾ لەو کاتەدا فریشتەکان وتیان: ئەی مەریەم خودا مژدەی بەڵێنێکی خۆیت پێدەدات. واتە: مژدەت پێدەدا بە منداڵێ بە وتەیەك لە خوداوە. واتە: پێی دەڵێ: ببە ئەویش دەبێ، ئەمە مانای ئەم دەقەیە کە خودای مەزن

[1] إبن جرير (٦/٣٥١).

[2] إبن أبي حاتم (٢/٢٦٦).

[3] إبن أبي حاتم (٢/٢٦٧-٢٦٨).

دەفەرمووێت: ﴿مُصَدِّقًا بِكَلِمَةٍ مِّنَ ٱللَّهِ﴾[1] هەموو فەرموودەی خودا دەسەلمێنێ. وەك (جمهور) باسیان کردوە ﴿ٱسْمُهُ ٱلْمَسِيحُ عِيسَى ٱبْنُ مَرْيَمَ﴾ کە ناوی مەسیح (عیسا)ی کوڕی مەریەمە. واتە: بەمە ناو دەردەکات لە دنیاداو خاوەن باوەڕان وا دەیناسن، بۆیە ناو براوە بە مەسیح، ئەگەر دەستی بهێنایە بەسەر هەر کەسێکی نەخۆشدا بە ئیزنی خودای مەزن چاك دەبووەوە. ﴿عِيسَى ٱبْنُ مَرْيَمَ﴾ بۆیە خراوەتە پاڵ دایکی چونکە باوکی نیە. ﴿وَجِيهًا فِى ٱلدُّنْيَا وَٱلْءَاخِرَةِ وَمِنَ ٱلْمُقَرَّبِينَ﴾ لە دنیاو لە قیامەتیش قەدری هەیەو یەکێك دەبێ لە نزیکەکانی خودا. واتە: ڕێزو قەدری هەیە لە دنیادا لە لای خودا بەهۆی ئەو پەیامەوە کە بۆی دەنێرێو ئەو شەریعەتەی کە تێی دەگەیەنێو لەو شتانەش کە پێی دەبەخشێ. لە ڕۆژی قیامەتیشدا تکا دەکات لەلای خودا بۆ ئەو کەسانەی خودا ئیزنی ئەداو داواکەی لێ وەردەگرێ وەك پێغەمبەرە لێبڕاوە نەبەزەکان (أولي العزم) سەلامی خوا لە هەموویان بێ .

**قسە کردنی عیسا (سەلامی خوای لێ بێ) لە بێشکەدا**

﴿وَيُكَلِّمُ ٱلنَّاسَ فِى ٱلْمَهْدِ وَكَهْلًا﴾ لە بێشکەداو بە گەورەیش قسە لەگەڵ مەردوم دەکات. واتە: بانگی خەڵکی دەکات بۆ ناسینی خودای تەنیاوبێ هاوەڵ هەر لە منداڵیدا وەك موعجیزەو نیشانەیەك، بە گەورەیش کە نیگای بۆ دێ (هەر بەردەوام دەبێ) موحەممەدی کوڕی ئیسحاق لە ئەبوهورەیرەوە ڕیوایەتی کردوە: پێغەمبەری خودا (ﷺ) فەرموویەتی: (هیچ لەدایك بوویەك لە منداڵیدا قسەی نەکردووە جگە لە عیساو هاوەڵەکەی جورەیج)[2] ئیبنوئەبی حاتەمیش لە ئەبوهورەیرەوە ڕیوایەتی کردوە لە پێغەمبەری خوداوە کە فەرموویەتی: (جگە لە سیان، کەسی تر لە بێشکەدا قسەی نەکردووە: عیساو منداڵێك لە زەمانی جورەیجداو منداڵێکی تریش).[3] ﴿وَمِنَ ٱلصَّٰلِحِينَ﴾ یەکێك لە پیاوچاکان دەبێ. لە گوفتارو کرداریداو زانستێکی چاكو ئاکارێکی باشی هەیە.

**وەدیهێنانی عیسا (سەلامی خوای لێ بێ) بەبێ باوك**

کاتێ کە مەریەم مژدەی فریشتەکانی بیست لەو بارەیەوە لەلایەن خوداوە. لە لاڵانەوەکەیدا: ﴿قَالَتْ رَبِّ أَنَّىٰ يَكُونُ لِى وَلَدٌ وَلَمْ يَمْسَسْنِى بَشَرٌ﴾ ئەی پەروەردگاری من. جا چۆن من کوڕم دەبێ، هیچ مرۆڤێك ئێستا توخوونم نەکەوتووە. ناشمەوێ هاوسەرگیری بکەمو پەنا دەگرم بە خودا ئافرەتێکی

[1] آل عمران (٣٩).

[2] إبن أبي حاتم (٢/٢٧٢-٢٧٣).

[3] إبن أبي حاتم (٢/٢٧٢)، البخاري (٣٤٣٦)، مسلم (٢٥٥٠).

بەدکاریش نەبوو؟ فریشتەکان لەلایەن خوداوە وەڵامی ئەو پرسیارەی ئەدەنەوە ﴿قَالَ كَذَٰلِكِ اللَّهُ يَخْلُقُ مَا يَشَاءُ﴾ وتی: خودا هەرچی حەز بکات بەدی دێنێ. واتە: ئەمە فەرمانی خودای مەزنەو هیچ شتێ نابێتە لەمپەر لە ڕێیدا. خودای مەزن لێرەدا دەفەرمووێت: ﴿يَخْلُقُ مَا يَشَاءُ﴾ مەیلی لە هەر شتێ بێ دروستی دەکات. نەیفەرموە: دەیکات. وەك لە بەسەرهاتەکەی زەکەرییادا. بەڵکو فەرموویەتی: دروستی دەکات بۆ ئەوەی گومان بۆ هیچ کەسێ نەمێنێ لەو کەسانەی کە گومان دەکەن‌و جەختیشی لەسەر دەکاتەوە ﴿إِذَا قَضَىٰ أَمْرًا فَإِنَّمَا يَقُولُ لَهُ كُن فَيَكُونُ﴾ هەرکە ویستی کارێك ببێ هەر پێی دەڵێ: ببە، ئەوجا دەبێ. واتە: هیچ دواناکەوێ، بەڵکو بە دوای فەرمانەکەدا یەکسەر پەیدا دەبێ. وەك ئەم ئایەتەیش کە خودای گەورە دەفەرمووێت: ﴿وَمَا أَمْرُنَا إِلَّا وَاحِدَةٌ كَلَمْحٍ بِالْبَصَرِ﴾[1] کاری ئێمە یەکجارەیەو هەر لە چاوتروکانێکدا کۆتایی دێ. واتە: فەرمانی ئێمە یەکجارەیەو دووبارە بوونەوەی نیە، زوو بە پەلە دەبێ لە چاو تروکانێکدا ڕوودەدات .

﴿وَيُعَلِّمُهُ الْكِتَابَ وَالْحِكْمَةَ وَالتَّوْرَاةَ وَالْإِنجِيلَ ﴿٤٨﴾ وَرَسُولًا إِلَىٰ بَنِي إِسْرَائِيلَ أَنِّي قَدْ جِئْتُكُم بِآيَةٍ مِّن رَّبِّكُمْ ۖ أَنِّي أَخْلُقُ لَكُم مِّنَ الطِّينِ كَهَيْئَةِ الطَّيْرِ فَأَنفُخُ فِيهِ فَيَكُونُ طَيْرًا بِإِذْنِ اللَّهِ ۖ وَأُبْرِئُ الْأَكْمَهَ وَالْأَبْرَصَ وَأُحْيِي الْمَوْتَىٰ بِإِذْنِ اللَّهِ ۖ وَأُنَبِّئُكُم بِمَا تَأْكُلُونَ وَمَا تَدَّخِرُونَ فِي بُيُوتِكُمْ ۚ إِنَّ فِي ذَٰلِكَ لَآيَةً لَّكُمْ إِن كُنتُم مُّؤْمِنِينَ ﴿٤٩﴾ وَمُصَدِّقًا لِّمَا بَيْنَ يَدَيَّ مِنَ التَّوْرَاةِ وَلِأُحِلَّ لَكُم بَعْضَ الَّذِي حُرِّمَ عَلَيْكُمْ ۚ وَجِئْتُكُم بِآيَةٍ مِّن رَّبِّكُمْ فَاتَّقُوا اللَّهَ وَأَطِيعُونِ ﴿٥٠﴾ إِنَّ اللَّهَ رَبِّي وَرَبُّكُمْ فَاعْبُدُوهُ ۗ هَٰذَا صِرَاطٌ مُّسْتَقِيمٌ ﴿٥١﴾﴾

**سیفەتەکانی عیساو موعجیزەکانی و بانگەوازەکەی (سەلامی خوای لێ بێ)**

خودای مەزن باسی مژدەی تەواوی فریشتەکان دەکات بە پێدانی مەریەم بەو کوڕەی کە عیسایە (سەلامی خوای لێ بێ). ﴿وَيُعَلِّمُهُ الْكِتَابَ وَالْحِكْمَةَ وَالتَّوْرَاةَ وَالْإِنجِيلَ﴾ هەر خودا خۆی فێری کتێب‌و خوێندن‌و لەکارزانی‌و تەورات‌و ئینجیلی دەکات. مەبەست لێرەدا بە ﴿الْكِتَابَ﴾ نووسینەو ﴿وَالْحِكْمَةَ﴾ لەکارزانیە لە تەفسیری سورەتی (بەقەرە)دا باسی (الحكمة) کراوە، ﴿وَالتَّوْرَاةَ وَالْإِنجِيلَ﴾ تەورات: ئەو کتێبەیە کە خودا ناردی بۆ مووسای کوڕی عیمران. ئینجیلیش ئەو کتێبەیە کە

---

[1] القمر (٥٠).

خودا ناردی بۆ عیسا (سەلامی خوای لێ بێ) کە تەوراتو ئینجیلیشی لەبەر بوو ﴿وَرَسُولًا إِلَىٰ بَنِيٓ إِسۡرَٰٓءِيلَ﴾ دەشیکات بە پێغەمبەرێك بۆ سەر نەوەی ئیسرائیل. کە پێیان بڵێ: ﴿أَنِّي قَدۡ جِئۡتُكُم بِـَٔايَةٖ مِّن رَّبِّكُمۡ أَنِّيٓ أَخۡلُقُ لَكُم مِّنَ ٱلطِّينِ كَهَيۡـَٔةِ ٱلطَّيۡرِ فَأَنفُخُ فِيهِ فَيَكُونُ طَيۡرَۢا بِإِذۡنِ ٱللَّهِ﴾ ئەوا من لە پەروەردگارمەوە نیشانەم بۆ هێناون، هەر لە قوڕی شل مەلێك دروست دەکەم، بە ئیزنی خودا فوی پیدا دەکەم دەبێتە باڵدارێکی تەواو. هەر واشی دەکرد، لە قوڕ وێنەی باڵدارێکی دروست دەکرد، پاشان فوی پیدا دەکرد، بەبەر چاوی ئەو خەڵکەوە دەفڕی (بە ئیزنی خودای گەورە) کە کردبوی بە موعجیزەیەك لەسەر ئەوە کە خودا ڕەوانەی کردوە ﴿وَأُبۡرِئُ ٱلۡأَكۡمَهَ﴾ کوێری زکماکیش چاك دەکەمەوە، کە ئەمە زۆر کارێکی گەورەو گرنگ بوو، بەڵگەیەکی بەهێزیش بوو بۆ بەرەنگار بوونەوە. ﴿وَٱلۡأَبۡرَصَ﴾ پێست بەڵەکیش چاك دەکەمەوە بە ئیزنی خودا ﴿وَأُحۡيِ ٱلۡمَوۡتَىٰ بِإِذۡنِ ٱللَّهِ﴾ بە ئیزنی خودا مردووش زیندوو دەکەمەوە. زۆرێك لە زانایان وتویانە: خودای مەزن هەر پێغەمبەرێکی ناردووە بە موعجیزەیەکەوە ناردوویەتی کە گونجاو بووە بۆ خەڵکی ئەو زەمانە. لە زەمانی موسادا (سەلامی خوای لێ بێ) جادووگەریو ڕێزگرتنی جادووگەر زۆر باوبوە، خودای گەورە موعجیزەیەکی وای نارد کە چاوەکانی داگیر دەکردنو هەموو جادووگەرەکانی سەرسام کردبوو. کاتێ کە بۆیان دەرکەوت ئەو موعجیزانە لەلایەن خودایەکی خاوەن تواناو دەستەڵاتەوەیە، بڕوایان دەهێناو ملیان کەچ دەکردو دەبوونە پیاوە زۆر چاکەکان. بەڵام عیسا (سەلامی خوای لێ بێ) لە چەرخی پزیشکیو زانستە سروشتیەکاندادەرکەوت. چەند نیشانەیەکی بۆ هێنابوون کە هیچ کەسێ ناتوانێ بیانهێنێ. مەگین کەسێ لە لایەن خوداوە یارمەتی بدرێت، پزیشك چۆن دەتوانێ بێ گیان زیندو بکاتەوە یان کوێری زکماكو بەڵەك چاك بکاتەوە، کەسێ زیندوو بکاتەوە کە لە گۆڕەکەیدا مردوە هەتا ڕۆژی قیامەت تێیدا بمێنێتەوە. هەر بەو جۆرەیش خودا موحەممەدی (ﷺ) ناردووە لە چەرخی ڕەوانبێژیو کێ بەرکێی شاعیرەکاندا، بە کتێبێکەوە هاتووە بۆ لایان لەلایەن خوداوە کە هەموو مرۆڤو جنۆکە گشت کۆ ببنەوە کە بەشێوەی ئەم قورئانە بێنن یان دە سورەت یان تەنیا سورەتێ ناتوانن بیهێنن، با هەندێکیشیان هاوکاری یەکتری بکەن. چونکە وتەی خودای مەزن هەرگیز لە وتەی کەس ناچێ. پاشان خودای مەزن لەسەر زمانی عیسا (سەلامی خوای لێ بێ) دەفەرمووێت: ﴿وَأُنَبِّئُكُم بِمَا تَأۡكُلُونَ وَمَا تَدَّخِرُونَ فِي بُيُوتِكُمۡۚ إِنَّ فِي ذَٰلِكَ لَأٓيَةٗ لَّكُمۡ إِن كُنتُم مُّؤۡمِنِينَ﴾ هەرچی لە ماڵتاندا دەیخۆن، هەرچی تێشیدا دەیهێڵنەوە پێتانی دەڵێم. ئەمانە بەڵگەو نیشانەن بۆتان، ئەگەر بڕواتان ببێ بە ڕاستگۆیی من بەوەی کە بۆم هێناون. ﴿وَمُصَدِّقٗا لِّمَا بَيۡنَ يَدَيَّ مِنَ ٱلتَّوۡرَىٰةِ﴾ بڕوام هەیە بەو تەوراتەی کە لەلامە. واتە:

کاری بە تەوراتیش کردووە ﴿وَلِأُحِلَّ لَكُم بَعْضَ ٱلَّذِى حُرِّمَ عَلَيْكُمْ﴾ بە ئەرکی خۆیشمی دەزانم کە هەندێ شتتان بۆ حەلاڵ بکەم کە لێتان حەرام کراوە. ئەم ئایەتە بەڵگەیە لەسەر ئەوە کە عیسا (سەلامی خوای لێ بێ) هەندێ لە شەریعەتی تەوراتی نەسخ کردۆتەوە. ئەو شتانەی کە لەلای ئەوان ڕوون نەبوون ناکۆکیان لەسەری هەبوو بۆی ئاشکرا کردن. وەك خودای مەزن لە ئایەتێکی تردا دەفەرموێت: ﴿وَلِأُبَيِّنَ لَكُم بَعْضَ ٱلَّذِى تَخْتَلِفُونَ فِيهِ﴾[1] تا هەندێك لەوەتان بۆ ڕوون بکەمەوە کە لەسەری کێشەتانە( والله أعلم). ﴿وَجِئْتُكُم بِـَٔايَةٍ مِّن رَّبِّكُمْ فَٱتَّقُوا۟ ٱللَّهَ وَأَطِيعُونِ﴾ من نیشانەم لە پەروەردگاری ئێوەوە بۆ هێناون، دەسا ئێوە لە فەرمانی من دەرمەچنو لە خودا ترستان هەبێ. ﴿إِنَّ ٱللَّهَ رَبِّى وَرَبُّكُمْ فَٱعْبُدُوهُ ۗ هَـٰذَا صِرَٰطٌ مُّسْتَقِيمٌ﴾ پەروەرێنی منو ئێوە هەر خودایە، دەسا هەر ئەو بپەرستن، ئەمە ڕێگەیەکی ڕاستە. ئێمەو ئێوە هیچ جیاوازیەکمان نیەلە خواپەرستیو ملکەچیو زەلیلیدا بەرانبەر بە خودا.

﴿فَلَمَّآ أَحَسَّ عِيسَىٰ مِنْهُمُ ٱلْكُفْرَ قَالَ مَنْ أَنصَارِىٓ إِلَى ٱللَّهِ ۖ قَالَ ٱلْحَوَارِيُّونَ نَحْنُ أَنصَارُ ٱللَّهِ ءَامَنَّا بِٱللَّهِ وَٱشْهَدْ بِأَنَّا مُسْلِمُونَ ﴿٥٢﴾ رَبَّنَآ ءَامَنَّا بِمَآ أَنزَلْتَ وَٱتَّبَعْنَا ٱلرَّسُولَ فَٱكْتُبْنَا مَعَ ٱلشَّـٰهِدِينَ ﴿٥٣﴾ وَمَكَرُوا۟ وَمَكَرَ ٱللَّهُ ۖ وَٱللَّهُ خَيْرُ ٱلْمَـٰكِرِينَ ﴿٥٤﴾﴾

### حەواریەکان یارمەتی عیسا (سەلامی خوای لێ بێ) ئەدەن

خودای مەزن دەفەرموێت: ﴿فَلَمَّآ أَحَسَّ عِيسَىٰ مِنْهُمُ ٱلْكُفْرَ﴾ عیسا پاش ئەوەی تێگەیش کە باوەڕی پێ ناهێننو بەردەوامن لەسەر گومرایی ﴿قَالَ مَنْ أَنصَارِىٓ إِلَى ٱللَّهِ﴾ وتی: کێ بەرەو ڕێگەی خودا دەبێتەپشتیوانم؟ موجاهید وتی: کێ شوێنم دەکەوێ بۆ لای خودا[2]، وا دیارە مەبەستی مەسیحیەکان بۆ (کێ یارمەتیم ئەدا) لەو بانگەوازەدا بۆ ڕێی خودا؟ وەك پێغەمبەر(ﷺ) لەکاتی دروشمەکانی حەجدا لە پێش کۆچ کردنیا بۆ مەدینە دەگەڕاو داوای یارمەتی دەکرد: (ئەو پیاوە کێ یە دەمگرێتە خۆی هەتا وتەی پەروەردگارم ڕاگەیەنم، چونکە قورەیش ڕێگەیان لێگرتووم وتەی پەروەردگارم ڕاگەیەنم)[3] هەتا ڕێی کەوت لە ئەنساریەکان، گرتیانە خۆیانو یارمەتیان داو کۆچی کرد بۆ لایان بوونە هاوکاریو پارێزگاریان لە ڕەشو سوور لێ دەکرد (ڕەزای خوایان لێ بێ) واتە: بە هەموو

---

[1] الزخرف (٦٣).

[2] إبن أبي حاتم (٢/٢٩٠).

[3] أحمد (٣/٢/٣٢٢)، سەحیحە.

شێوەیەك پارێزگاریان لێ دەكرد. هەر بەو شێوەیەش عیسای كوڕی مەریەم دەستەیەك لە نەوەی ئیسرائیل وەڵامی بانگەوازەكەیان دایەوەو بڕوایان پێ هێناو بوونە هاوكارو پشتیوانیو شوێنی ئەو ڕوناكیە كەوتن كە بۆی ڕەوانە كرابوو. هەر بۆیە خودای مەزن باسیان دەكاتو دەفەرموێت: ﴿قَالَ ٱلْحَوَارِيُّونَ نَحْنُ أَنصَارُ ٱللَّهِ ءَامَنَّا بِٱللَّهِ وَٱشْهَدْ بِأَنَّا مُسْلِمُونَ ﴿٥٢﴾ رَبَّنَآ ءَامَنَّا بِمَآ أَنزَلْتَ وَٱتَّبَعْنَا ٱلرَّسُولَ فَٱكْتُبْنَا مَعَ ٱلشَّٰهِدِينَ﴾ حەوارییەكان وتیان: ئێمەین لە ڕێی خودا یاریدەرین، بڕوامان بە خودا هێناو تۆش شایەت بە، ئێمە خۆمان بەو دەسپێرین. ئەی پەروەردگاری هەموومان، بەو شتەی تۆ بۆ ئێمەت نارد، بڕوامان كردو كەوتینە شوێن پێغەمبەرەكەت، تۆ لەگەڵ شایەتەكاندا بماننووسە.

وتراوە ﴿ٱلْحَوَارِيُّونَ﴾ لەبەر ئەوە ناونراون بە حەواری لەبەر ئەوەی جلو بەرگەكانیان سپی بووە. بەڵام ڕاستتر ئەوەیە كە حەواری واتە: یارمەتیدەر. وەك لە هەردوو سەحیحەكەدا هاتووە كە پێغەمبەری خودا (ﷺ) خەڵكی بانگ كرد بۆ ڕۆژی ئەحزاب. زوبەیر بەپەلە ئامادە دەبوو، پاشان جارێكی تر بانگی دەكردن هەر زوبەیر زوو ئامادە دەبوو. پێغەمبەر (ﷺ) فەرمووی: (هەموو پێغەمبەرێ حەوارییەكی هەبووە، حەواری من زوبەیرە)[1] ئیبنوئەبی حاتەم ڕیوایەتی كردووە لە ئیبنوعەبباسەوە (ڕەزای خوایان لێ بێ) لەم ئایەتەدا ﴿فَٱكْتُبْنَا مَعَ ٱلشَّٰهِدِينَ﴾ تۆ لەگەڵ شایەتەكاندا بماننووسە. وتی: لەگەڵ ئوممەتی موحەممەد دا(ﷺ)[2].

### جوولەكە ویستیان عیسا (سەلامی خوای لێ بێ) بكوژن

پاشان خودا باسی ئەوەی ئیسرائیل دەكات كە ویستیان عیسا (سەلامی خوای لێ بێ) بكوژن، دەستیان دایە فێڵو تەڵەكە نانەوە بۆ ئەوەی پەلاماری بدەنو بیدەن لە خاچ، دەستیان دایە پیلان نانەوەو هەواڵیان دا بە پاشای ئەو زەمانە كە خوانەناس بوو تێیان گەیاند كە پیاوێك لێرە پەیدا بووەو خەڵكی گومڕا دەكاتو هەڵیاندەنێ دژایەتی پاشا بكەنو خەڵك هەڵدەخەڵەتێنێو كوڕو باوك لە یەكتری جیا دەكاتەوەو تووشی زۆر شتی تریشیان دەكات. زۆر درۆی تریشیان بۆ هەڵدەبەستو دەیان وت منداڵی زینایە، بۆ ئەوەی زیاتر ڕقو كینی پاشا هەڵسێت. پاشایش دەستەیەكی بۆ ناردو فەرمانی دا كە هەركەسێ گرتی هەڵیواسێو سزای بدات، كاتێ كە دەورەی ماڵەكەیان دا، وایان زانی زاڵ بوون بەسەریدا، خودا لە نێوان ئەواندا ڕزگاری كرد لە كلاو ڕۆشنەی ئەو ماڵەوە بەرزی كردەوە بۆ ئاسمان. خودا شێوەی عیسای خستە سەر پیاوێك كە لەلای بوو لەو ماڵەدا، كاتێ ئەوانە چوونە ژوورەوە لە

---

[1] فتح الباري (٦/٦٣)، مسلم (٤/١٨٧٩).

[2] إبن أبي حاتم (٢/٢٩٤). ئەم فەرموودە سەنەدەكەی چاكە.

تاریکایی شەودا وایان زانی ئەوە عیسایە. گرتیان‌و خراپەیان دەربارەی کردو هەڵیانواسی‌و دڕکیان کوتا بەسەریدا، ئەمە نەخشەیەك بوو بۆیان لەلایەن خوداوە، کە پێغەمبەرەکەی خۆی ڕزگار کردو لە نێوانیاندا بەرزی کردەوەو لە گومڕایی خۆیاندا بەردەوام بوون سەریان لێ شێوا بوو، وایاندەزانی ئەوەی ئەوان ویستویانە بەدەستیان هێناوە. بەڵام خودای مەزن دڵینی ڕەق کردو کەوتنە دژایەتی‌و لاساری بەرانبەر بە هەق،ئیتر ئەوە پیشەیان بوو هەتا خودا زەلیلی‌و ڕسوایی کردە کاڵای باڵایان هەتا ڕۆژی قیامەت، هەر بۆیە خودای مەزن دەفەرمووێت: ﴿وَمَكَرُوا وَمَكَرَ اللَّهُ وَاللَّهُ خَيْرُ الْمَاكِرِينَ﴾ (جوولەکەکان) فڕوفێڵیان کرد (بۆ کوشتنی عیسا) خودایش تۆڵەی فڕوفێڵەکانی لێ کردنەوە. خودا چاکترین تۆڵە سێنەرە لە فێڵبازان.

﴿إِذْ قَالَ اللَّهُ يَا عِيسَىٰ إِنِّي مُتَوَفِّيكَ وَرَافِعُكَ إِلَيَّ وَمُطَهِّرُكَ مِنَ الَّذِينَ كَفَرُوا وَجَاعِلُ الَّذِينَ اتَّبَعُوكَ فَوْقَ الَّذِينَ كَفَرُوا إِلَىٰ يَوْمِ الْقِيَامَةِ ۖ ثُمَّ إِلَيَّ مَرْجِعُكُمْ فَأَحْكُمُ بَيْنَكُمْ فِيمَا كُنتُمْ فِيهِ تَخْتَلِفُونَ (٥٥) فَأَمَّا الَّذِينَ كَفَرُوا فَأُعَذِّبُهُمْ عَذَابًا شَدِيدًا فِي الدُّنْيَا وَالْآخِرَةِ وَمَا لَهُم مِّن نَّاصِرِينَ (٥٦) وَأَمَّا الَّذِينَ آمَنُوا وَعَمِلُوا الصَّالِحَاتِ فَيُوَفِّيهِمْ أُجُورَهُمْ ۗ وَاللَّهُ لَا يُحِبُّ الظَّالِمِينَ (٥٧) ذَٰلِكَ نَتْلُوهُ عَلَيْكَ مِنَ الْآيَاتِ وَالذِّكْرِ الْحَكِيمِ (٥٨)﴾

**ماناى (متوفيك)**

خودای مەزن دەفەرمووێت: ﴿إِذْ قَالَ اللَّهُ يَا عِيسَىٰ إِنِّي مُتَوَفِّيكَ وَرَافِعُكَ إِلَيَّ﴾ پاشان خودا فەرمووی: ئەی عیسا من بۆ خۆمت دەبەمەوەو لەلای خۆم جێ بەرز دەبی. مەبەست بە (الوفاة) لێرەدا خەوە. وەك خودای گەورە لە ئایەتی تردا دەفەرمووێت: ﴿وَهُوَ الَّذِي يَتَوَفَّاكُم بِاللَّيْلِ﴾[1] هەر (خودا) خۆیەتی بە شەو هەستتان لێ دەسێنێ. یان دەفەرمووێت: ﴿اللَّهُ يَتَوَفَّى الْأَنفُسَ حِينَ مَوْتِهَا وَالَّتِي لَمْ تَمُتْ فِي مَنَامِهَا﴾[2] ئەوانەی کاتی مردنیان دێت، ئەوانەشی کە دەخەون‌و نەمردوون، خودا گیانیان ڕادەگرێ. پێغەمبەری خودا (ﷺ) کاتێ کە لە خەو هەڵدەسا ئەیفەرموو: (سوپاس بۆ ئەو خودایە زیندووی کردینەوە دوای ئەوە کە مراندینی، گەڕانەوەش هەر بۆ لای ئەوە)[3] خودای گەورە دەفەرمووێت: ﴿وَبِكُفْرِهِمْ وَقَوْلِهِمْ عَلَىٰ مَرْيَمَ بُهْتَانًا عَظِيمًا (١٥٦) وَقَوْلِهِمْ إِنَّا قَتَلْنَا الْمَسِيحَ عِيسَى ابْنَ مَرْيَمَ

---

[1] الانعام (٦٠).

[2] الزمر (٤٢).

[3] فتح الباري (١١/١٣٤).

رَسُولَ اللَّهِ وَمَا قَتَلُوهُ وَمَا صَلَبُوهُ وَلَكِن شُبِّهَ لَهُمْ وَإِنَّ الَّذِينَ اخْتَلَفُوا فِيهِ لَفِي شَكٍّ مِّنْهُ مَا لَهُم بِهِ مِنْ عِلْمٍ إِلَّا اتِّبَاعَ الظَّنِّ وَمَا قَتَلُوهُ يَقِينًا ﴿١٥٧﴾ بَل رَّفَعَهُ اللَّهُ إِلَيْهِ وَكَانَ اللَّهُ عَزِيزًا حَكِيمًا ﴿١٥٨﴾ وَإِن مِّنْ أَهْلِ الْكِتَابِ إِلَّا لَيُؤْمِنَنَّ بِهِ قَبْلَ مَوْتِهِ وَيَوْمَ الْقِيَامَةِ يَكُونُ عَلَيْهِمْ شَهِيدًا﴾[1] لەبەر لە ڕێی خوا لادانو ئەو بوختانە گەورە بۆ مریەمیان هەڵبەست، لەبەر ئەوەیش کە دەیانوت: ئێمە عیسای کوڕی مەریەممان لەناو برد (کە پێغەمبەری خودا بوو) کەچی نە کوشتیان، نە توانیان لە خاچی بدەن سەریان لێ تێکچوو بوو، نەیانناسی. هەتا دەگاتە ﴿وَمَا قَتَلُوهُ يَقِينًا﴾ بێگومان نەیان کوشتووە. ﴿بَل رَّفَعَهُ اللَّهُ إِلَيْهِ وَكَانَ اللَّهُ عَزِيزًا حَكِيمًا﴾ بەڵکو خودا بەرەو خۆی بەرزی کردەوە. خودا هەمیشە خاوەن دەسەڵات بووەو لەکارزانە. لەوانەی ئەهلی کتێبن، هەرکەسێکیان (بەر لە مەرگی) بڕوا بە عیسا دەهێنێ، دیارە (عیسا) ڕۆژی قیامەت دەبێتە شایەت لەسەریان. ئەو(جێناوە)(ە) کە دەفەرموێت: ﴿قَبْلَ مَوْتِهِ﴾ پێش لە مردنی، دەگەڕێتەوە بۆ عیسا پێش لە مردنی. کاتێ کە عیسا دادەبەزێتە سەر زەمین لە پێش ڕۆژی قیامەتدا، وەك بەو زوانە باسی دێت، ئا لەو کاتەدا هەموونەهلی کتێب بڕوای پێدەهێنن، چونکە سەرانە لادەباو جگە لە موسوڵمان بوونیان لێ قبووڵ ناکات. واتە دەبێ موسوڵمان بن. ئیبنوئەبی حاتەم ڕیوایەتی کردوە لە حەسەنەوە کە لەم دەقەدا کە خودای گەورە دەفەرموێت: ﴿إِنِّي مُتَوَفِّيكَ﴾ من بۆ خۆمت دەبەمەوە. وتی: یانی مردنی خەو. خودا لە کاتی خەوتنیدا بەرزی کردەوە[2].

**گۆڕین و دەستکاری کردن لە ئاینی مەسیحدا**

﴿وَمُطَهِّرُكَ مِنَ الَّذِينَ كَفَرُوا﴾ لەوانەت پاك دەکەمەوە کە باوەڕیان نەهێناوە. واتە: بەرزت دەکاتەوە بۆ ئاسمان ﴿وَجَاعِلُ الَّذِينَ اتَّبَعُوكَ فَوْقَ الَّذِينَ كَفَرُوا إِلَىٰ يَوْمِ الْقِيَامَةِ﴾ ئەوانەشی کە پەیڕەوی تۆن هەتا قیامەت زاڵیان دەکەم بەسەر بێ باوەڕەکاندا. هەر وایش بوو. کاتێ عیسا (سەلامی خوای لێ بێ) خودا بەرزی کردەوە بۆ ئاسمان، هاوەڵەکانی دوای خۆی بوون بە چەند بەشەوە، هەندێکیان بڕوایان هێنا بەو پەیامەی کە بۆی هاتبوو کە عەبدو پێغەمبەری خودایەوس کوڕی مەریەمە، هەندێکیان زۆر زیادەڕەویان کردو بە کوڕی خوایان دادەنا، هەندێکی تر دەیان وت: عیسا خۆی خودایە، هەندێکی تریشیان دەیان وت: ئەو سێ هەمە لە سیانەکە. خودای مەزن لە قورئاندا قسەکانی باس کردونو وەڵامی هەموویانی داوەتەوە. ئەوانەی ماوەی نزیکەی سێ سەد ساڵ لەسەری بەردەوام بوون. پاشان

---

[1] النساء (١٥٦-١٥٩).

[2] إبن أبي حاتم (٢/٢٩٦).

پاشایەك لە پاشاكانی یونان لەناویاندا سەری هەڵدا. پێیان دەوت قوستەنتین، چووە ناو ئاینی نەسرانی، هەندێ دەڵێن: بە فێڵبازی بوەتە گاور هەتا خراپی بكاتو تێكی بدات. فەیلەسوفیش بووە، هەندێكیش دەڵێن: لە نەفامی خۆیەوە بوەتە گاور. ئەو پیاوە هەڵسا بە گۆڕینو دەستكاری كردنی ئاینی مەسیحی بۆیانو زیادوكەمی تیا كردو دەستوورو ئەمانەتی گەورەی بۆ دانان. كە بریتی بوو لە خەیانەتی سووكو بێ نرخ. لە زەمانی خۆیدا گۆشتی بەرازیشی بۆ حەڵاڵ كردن. ئاینەكەی بەرەو خۆرهەڵات هات. وێنەی كلێسایان بۆ كێشا. دە ڕۆژیش ڕۆژووی بۆ زیاد كردن بەهۆی ئەو گوناهانەوە دەیكەن وەك خۆیان وادەزانن. وای لێهات ئاینی مەسیحی بووە ئاینی قوستەنتین، چەندین كلێساو پەرستگاو دێرو لوتكەو ئەشكەوتی بۆ دروست كردن كە ژمارەیان دەگەیشتە دوانزەهەزار پەرستگە. ئەو شارەیشی بە ناوی خۆیەوە دروست كرد. دەستەی مەلەكیە (الملیكة) شوێنی كەوتن، لەگەڵ ئەمانەدا هەمووی زاڵ بوون بەسەر جوولەكەكانداو خودا یارمەتی دان. چونكە ئەمانە لە جوولەكەكان لە هەقەوە نزیكتر بوون. هەرچەندە هەموویان خوانەناس بوو، كاتێ كە خودا موحەممەدی (ﷺ) ڕەوانە كرد ئەوانەی كە بڕوایان پێ هێنا باوەڕیان بە خوداو فریشتەكانو كتێبەكانو پێغەمبەرەكان هەیەو، ئەوانە شوێن كەوتوی هەموو پێغەمبەرەكانن لەسەر زەویدا. چونكە ئەوانە بڕوایان بەم پێغەمبەرە نەخوێندەوارە كە كۆتا پێغەمبەرەو بەڕێزترین نەوەی ئادەمە هەیە. كە داوای كردوە لێیان كە بڕوایان هەبێ بە گشت ڕاستیەكو وە دەبێ ئەوان باشتر بڕوایان هەبێ بەو پێغەمبەرەی لەسەر ئاینەكەین وەك خۆیان دەڵێن. لەگەڵ ئەوەیشدا دەستكاریان كردو بە ئارەزووی خۆیان گۆڕایان. خۆ ئەگەر هیچ لەمانەش نەبێ. ئاینەكانی ئەو پێغەمبەرانە (نەسخ) بونەتەوە بەو ئاینەی موحەممەد (ﷺ) كە خودا ناردوویەتی كە ئاینێكی ڕاستەو گۆڕانی بەسەردا نایە هەتا ڕۆژی قیامەت، بەردەوام سەركەوتووش دەبێ بەسەر گشت ئاینەكانی تردا. هەر بۆیە خودا دنیای لە ڕۆژهەڵاتو ڕۆژئاوادا ڕزگار كرد بۆ هاوەڵەكانی، هەموو گەلەكان ملیان بۆ دانەواندو كیسرایان تێكشكاندو قەیسەریان دوابڕاو كردو گەنجینەكانی داگیر كرانو لە ڕێی خوادا بەختیان كردنو بەخشییان، وەك پێغەمبەرەكەیان هەواڵی پێدان لەلایەن خودای مەزنەوە، ﴿وَعَدَ ٱللَّهُ ٱلَّذِينَ ءَامَنُواْ مِنكُمْ وَعَمِلُواْ ٱلصَّٰلِحَٰتِ لَيَسْتَخْلِفَنَّهُمْ فِى ٱلْأَرْضِ كَمَا ٱسْتَخْلَفَ ٱلَّذِينَ مِن قَبْلِهِمْ وَلَيُمَكِّنَنَّ لَهُمْ دِينَهُمُ ٱلَّذِى ٱرْتَضَىٰ لَهُمْ وَلَيُبَدِّلَنَّهُم مِّنۢ بَعْدِ خَوْفِهِمْ أَمْنًا يَعْبُدُونَنِى لَا يُشْرِكُونَ بِى شَيْـًٔا﴾[1] خودا بەوانەی لە ئێوە بڕوایان هەیەو ئاكار چاكن، بەڵێن ئەدا: لەم زەمینە دەیانكاتە جێنشین هەروەك چۆن ئەوانەی بەر لە ئەوانی كردە جێنشین. ئاینەكەشیان (كە خۆی پەسەندی كردوە) هەر بۆیان دادەمەزرێنێو ترسەكەشیان بۆ دەكاتە دڵنیایی و تەنیا من

[1] النور (٥٥).

دەپەرستن. هیچ شەریکێکیش بە شەریکی من دانانێن. هەر لەبەر ئەوە کە بەڕاستی باوەڕیان بە مەسیح بووە. وڵاتی شامیان لە دەست گاورەکان سەندۆتەوەو بەرەو ڕۆم دەریان کردوونو گەڕاونەتەوە بۆ شارەکەیان کە قوستەنتەنیەیە. بەردەوام ئیسلامو موسوڵمانان بالآدەستن بەسەریاندا. پێغەمبەری خودا (ﷺ) هەواڵی داوە بە ئوممەتەکەی کە موسوڵمانان لە کۆتاییدا قوستەنتەنیە (القسطنطنية) ئازاد دەکەن. هەرچی ماڵو سامانیانە بە دەستکەوت دێنن بۆ خۆیان. کوشتارێکی ئێجگار زۆر لە ڕۆمەکان دەکەن، کوشتارێکی وا کە هیچ کەسێ بە چاوی نەیدیوەو لەمەوبەدوایش نایبینێ. (باسێکم بۆ ئەمە بە تەنیا داناوە).

## هەڕەشە لە خوانەناسان بە سزادان لە دنیاو لە قیامەتدا

هەر بۆیە خودای مەزن دەفەرمووێت: ﴿وَجَاعِلُ ٱلَّذِينَ ٱتَّبَعُوكَ فَوْقَ ٱلَّذِينَ كَفَرُوٓاْ إِلَىٰ يَوْمِ ٱلْقِيَـٰمَةِ ۖ ثُمَّ إِلَيَّ مَرْجِعُكُمْ فَأَحْكُمُ بَيْنَكُمْ فِيمَا كُنتُمْ فِيهِ تَخْتَلِفُونَ ﴿٥٥﴾ فَأَمَّا ٱلَّذِينَ كَفَرُواْ فَأُعَذِّبُهُمْ عَذَابًا شَدِيدًا فِى ٱلدُّنْيَا وَٱلْـَٔاخِرَةِ وَمَا لَهُم مِّن نَّـٰصِرِينَ﴾ ئەوانەشی کەلە پەیڕەوانی تۆن، هەتا قیامەت زاڵیان دەکەم بەسەر بێباوەڕەکاندا، لە پاش ئەوە هەمووتان دێنەوە لای خۆمو بەو کێشەتان ڕادەگەم کە لە نێوانتاندا ڕوویدا. بەڵام ئەوانەی باوەڕیان پێ نەهێنای، لە دنیاشو لە قیامەتیش بە توندی سزایان ئەدەم. کەسیش بە هانایانەوە ناچێ. هەر بەو شێوەیەش خودای مەزن سزای ئەو جوولەکانەی دا کە بڕوایان بە عیسای کوڕی مەریەم نەهێناو (سەلامی خوایان لێ بێ) زۆر ڕۆچوون لە بارەی عیساوە. خودا تۆڵەی لێ سەندن بە کوشتنو دیل بوونو ماڵو سامان داگیر کردنو کەوتنە ژێر دەستی خاوەن دەستەڵاتەکانی ترو لە ڕۆژی قیامەتیشا توندترین سزایان ئەدات. ﴿وَمَا لَهُم مِّنَ ٱللَّهِ مِن وَاقٍ﴾[1] کەس ناتوانێ لە خودایان بپارێزێ. پاشان خودای مەزن دەفەرمووێت: ﴿وَأَمَّا ٱلَّذِينَ ءَامَنُواْ وَعَمِلُواْ ٱلصَّـٰلِحَـٰتِ فَيُوَفِّيهِمْ أُجُورَهُمْ ۗ وَٱللَّهُ لَا يُحِبُّ ٱلظَّـٰلِمِينَ﴾ ئەو کەسانەشی کە بڕوای تەواویان هێناو ئاکار چاك بوون، خودا هەموو پاداشتی خۆیان پێدەداتو خودا ستەمکارانی خۆش ناوێ. ﴿ذَٰلِكَ نَتْلُوهُ عَلَيْكَ مِنَ ٱلْـَٔايَـٰتِ وَٱلذِّكْرِ ٱلْحَكِيمِ﴾ ئەو شتانەی کە بۆ تۆمان خوێندۆتەوە، لە نیشانەکانی خوداو ڕێنیشاندەرن بۆلەکارزانی. واتە: ئائەمەی کە بۆ تۆمان باس کرد ئەی موحەممەد(ﷺ) دەربارەی عیسا (سەلامی خوای لێ بێ) لە دایکبوونو چۆنیەتی بەسەرهاتی، هەمووی نیگایە لەلایەن خوداوەیە بۆتو لە (اللوح المحفوظ) بۆی ڕەوانە کردووی و هیچ گومانێکی تێدا نیە. وەك خودای مەزن لە سورەتی مەریەمدا

---

[1] الرعد (٣٤).

فەرموویەتی: ﴿ذَٰلِكَ عِيسَى ٱبْنُ مَرْيَمَ ۚ قَوْلَ ٱلْحَقِّ ٱلَّذِى فِيهِ يَمْتَرُونَ ﴿٣٤﴾ مَا كَانَ لِلَّهِ أَن يَتَّخِذَ مِن وَلَدٍ ۖ سُبْحَٰنَهُۥٓ ۚ إِذَا قَضَىٰٓ أَمْرًا فَإِنَّمَا يَقُولُ لَهُۥ كُن فَيَكُونُ﴾[1] قسەی دروست لەسەر عیسای کوڕی مەریەم، هەر ئەمەیە، کە ئەمان تێیدا دوودڵن. لە خودا ناوەشێتەوە کە منداڵی هەبێ، پاکیو بێ عەیبی بۆ ئەوە، هەر گا ویستی کارێك ببێ، هەر پێی بڵێ: ببە! دەبێ.

﴿إِنَّ مَثَلَ عِيسَىٰ عِندَ ٱللَّهِ كَمَثَلِ ءَادَمَ ۖ خَلَقَهُۥ مِن تُرَابٍ ثُمَّ قَالَ لَهُۥ كُن فَيَكُونُ ﴿٥٩﴾ ٱلْحَقُّ مِن رَّبِّكَ فَلَا تَكُن مِّنَ ٱلْمُمْتَرِينَ ﴿٦٠﴾ فَمَنْ حَآجَّكَ فِيهِ مِنۢ بَعْدِ مَا جَآءَكَ مِنَ ٱلْعِلْمِ فَقُلْ تَعَالَوْا۟ نَدْعُ أَبْنَآءَنَا وَأَبْنَآءَكُمْ وَنِسَآءَنَا وَنِسَآءَكُمْ وَأَنفُسَنَا وَأَنفُسَكُمْ ثُمَّ نَبْتَهِلْ فَنَجْعَل لَّعْنَتَ ٱللَّهِ عَلَى ٱلْكَٰذِبِينَ ﴿٦١﴾ إِنَّ هَٰذَا لَهُوَ ٱلْقَصَصُ ٱلْحَقُّ ۚ وَمَا مِنْ إِلَٰهٍ إِلَّا ٱللَّهُ ۚ وَإِنَّ ٱللَّهَ لَهُوَ ٱلْعَزِيزُ ٱلْحَكِيمُ ﴿٦٢﴾ فَإِن تَوَلَّوْا۟ فَإِنَّ ٱللَّهَ عَلِيمٌۢ بِٱلْمُفْسِدِينَ ﴿٦٣﴾﴾

**لە یەکچوون لە دروست کردنی ئادەمو عیسادا**

﴿إِنَّ مَثَلَ عِيسَىٰ عِندَ ٱللَّهِ كَمَثَلِ ءَادَمَ ۖ خَلَقَهُۥ مِن تُرَابٍ ثُمَّ قَالَ لَهُۥ كُن فَيَكُونُ﴾ وێنەی عیسا (لە لای خودا) لە چەشنی وێنەی ئادەمە. هەر لە گڵ دروستی کردو پاشان پێی وت: (بە ئادەم) ببە، ئەویش بوو. واتە: خودا عیسای دروست کرد بەبێ باوكو ئادەمیشی دروست کرد بێ بابو دایك پاشان فەرمووی: ببە، بوو. ئەو کەسەی ئادەمی دروست کرد بێ بابو دایك، باشتر دەتوانێ عیسا دروست بکات بەبێ باوك. خۆ ئەگەر دروست بێ عیسا کوڕی خوا بێ لەبەر ئەوە بێ باوك دروست کراوە، دیارە ئەوە بۆ ئادەم ڕەواترە،بەڵام ئاشکرایە کە ئەوە قسەیەکی پڕوپوچو بێ بنەمایە. ئەو قسەیەی ئەوانەش زۆر پڕوپوچو زۆر درۆیە لەبارەی عیساوە (سەلامی خوای لێ بێ) بێگومان خودای مەزن ویستویەتی دەسەڵاتی خۆی دەرخات بۆ بەندەکانی کاتێ کە ئادەمی وەدیهێنا بەبێ نێرو مێو حەوای وەدی هێنا لە نێر بەبێ مێینەو عیسای وەدی هێنا لە مێ بەبێ نێر، ئەو دروستکراوانەی تریشی لە نێرو مێ وەدی هێناوە. هەر بۆیە لە سورەتی مەریەمدا فەرموویەتی: ﴿وَلِنَجْعَلَهُۥٓ ءَايَةً لِّلنَّاسِ﴾[2] تا بیکەینە نیشانەیەك بۆ خەڵکی. پاشان لێرەدا دەفەرموێت: ﴿ٱلْحَقُّ مِن رَّبِّكَ فَلَا تَكُن مِّنَ ٱلْمُمْتَرِينَ﴾ هەق هەر لە لای پەروەردگارتە لە ڕیزی دڵ بە گومانان مەبە. واتە: هەر ئەم قسە ڕاستە دەربارەی عیسا (سەلامی خوای لێ بێ) کە هیچ گومانی تێدا نیە. جگە لەمە هیچی تر ڕاست نیە. دوای هەق جگە لە پڕوپوچ هیچی تر نیە. پاشان خودای مەزن فەرمان دەکات بە پێغەمبەرەکەی (ﷺ) موباهەلە بکات

---

[1] مریم (٣٤_٣٥).

[2] مریم (٢١).

لەگەڵ ئەوانەدا کە دژایەتی هەق دەکەن دەربارەی عیسا (سەلامی خوای لێ بێ) دوای ئاشکرا کردنو ڕوون کردنەوەی.

**بانگ کردن بۆ موباهەلە کردن دەربارەی عیسا (سەلامی خوای لێ بێ)**

﴿فَمَنْ حَآجَّكَ فِيهِ مِنۢ بَعْدِ مَا جَآءَكَ مِنَ ٱلْعِلْمِ فَقُلْ تَعَالَوْا۟ نَدْعُ أَبْنَآءَنَا وَأَبْنَآءَكُمْ وَنِسَآءَنَا وَنِسَآءَكُمْ وَأَنفُسَنَا وَأَنفُسَكُمْ ثُمَّ نَبْتَهِلْ فَنَجْعَل لَّعْنَتَ ٱللَّهِ عَلَى ٱلْكَـٰذِبِينَ﴾ هەرکەسێ پاش ئەو زانستەی بۆ تۆ هات، ویستی کێشەت لەگەڵ دروست بکات، بڵێ: وەرن با کوڕانمانو ژنانمان یەکتری بانگ کەین، ئەوسا دەس کەینە لاڵەو نزاو نەفرینی خوا بنێرین بۆ ئەوانەی وا درۆزنن. واتە: با هەموو ئەوانە لە کاتی ئەو موباهەلەدا ئامادە بکەینو نەفرین بکەین لەوەمان کە درۆ دەکات. هۆی هاتنە خوارەوەی ئەم موباهەلەیەو ئایەتەکانی تری پێشیش لە سەرەتای سوورەتەکەوە هەتا ئێرە لەسەر شاندی (وەفدی) نەجران هاتۆتە خوارەوە. نەسرانیەکان کاتێ هاتن بۆ لای پێغەمبەر (ﷺ) کە قسە لە بارەی عیساوە بکەن، بە خوداو کوڕی خودایان دەزانی، خودای مەزن سەرەتای ئەم سورەتەی ناردە خوارەوەو وەڵامی دانەوە، وەك ئیمام موحەممەدی کوڕی ئیسحاقی کوڕی یەسارو کەسانی تریش دەڵێن: ئیبنوئیسحاق لە سیرەتە بەناوبانگەکەیدا دەڵێ: شاندی گاورەکانی نەجران کە شەست سوار دەبوون هاتن بۆ لای پێغەمبەری خودا (ﷺ) چواردە پیاویان لە پیاوماقوڵانی بوونو کارەکانیان بەوان سپاردبوو. ئەوانەش بریتی بوون لە: عاقب کە ناوی عەبدولمەسیح بوو. (سەید) کە ئەلئەیهەم بوو (حارسەی کوڕی عەلقەمە برای بەکری کوڕای وائلو ئووەیسی کوڕی حارسو زەیدو قەیسو یەزیدو نوبیە (نُبیة)و خوەیلدو عەمرو خالدو عەبدوڵلاو یوحەننەس (یُحَنَّس) کاری ئەمانە هەموو درابووە دەست سێ کەسیان: عاقیب کە سەرۆکی ئەو کۆمەڵە بوو، خاوەن قسەو ڕاوێژیان بوو، هیچ کارێکیان بێ ڕاوێژی ئەو نەدەکرد. سەید کە زانایان بوو، لێپرسراویشیان بوو لە ماڵەوەو لە سەفەریشدا. ئەبوحارسی کوڕی عەلقەمە، کە پیاوی ئاینیو زاناو پێشەواو خاوەنی قوتابخانەکانیشیان بوو. پیاوێکی عەرەب بوو لە بەنی بەکری کوڕی وائل، بەڵام چوو بووە سەر ئاینی مەسیحی، ڕۆمەکان زۆر ڕێزیان لێدەناو دەستەڵاتێکی باشیان پێدابوو، قەدریان دەگرت، چەندین کلیسایان بۆ دروست کردو یارمەتی چاکیان ئەداو خزمەتیان دەکرد، چونکە دەیانبینی کە زۆر ئاینەکەیانی بە توند گرتووە[1] ئەو پیاوە عەرەبە شارەزای کاری پێغەمبەری خودا بوو(ﷺ)، ئاگاداری ڕەوشتیشی بوو لە کتێبە پێشووەکاندا، بەڵام نەفامی خۆی پاڵی پێوەدەنا بۆ بەردەوام بوونی لەسەر گاوری، لەبەر ئەو ڕێزە زۆرەی کە دەیبینی لەوێداو ئەو پلەو پایەی لەناویاندا هەیبوو. ئیبنوئیسحاق وتی: موحەممەدی کوڕی

---

[1] إبن هشام (٢/٢٢٢).

جەعفەری کوڕی زوبەیر بۆی گێڕامەوە، وتی: (ئەو شاندە) هاتن بۆ لای پێغەمبەری خودا (ﷺ) لە مەدینە، کاتێ کە نوێژی عەسری کرد چوونە لای لە مزگەوت، جلو بەرگی زانایان لەبەر کردبوو لەو جوبەو بالاپۆشە جوانو قەشەنگانەی پیاوانی (بەنی حارسی کوڕی کەعب) لەبەریان دەکرد. وتی: هەرکەسێ لە هاوەڵەکانی پێغەمبەر چاوی پێیان کەوت، دەیوت: هیچ شاندێکمان لە وێنەی ئەمانە نەدیوە لە دوایدا. کە کاتی نوێژیان هات، هەڵسان لە مزگەوتی پێغەمبەردا نوێژیان کرد. پێغەمبەری خودا(ﷺ) فەرمووی: (وازیان لێ بێنن) بەرەو ڕۆژهەلات نوێژیان کرد. وتی: لەوانەی وتوێژیان لەگەڵ پێغەمبەردا (ﷺ) کرد. ئەبوحارسەی کوڕی عەلقەمەو عاقیبو عەبدولمەسیحو سید لئەیهەم (السید الایهم) ئەمانە مەسیحی بوون لەسەر ئاینی ئەو پاشایە بەو جیاوازیەش کە لەناوخۆیاندا بوویان. کە دەیان وت: عیسا خودایە، یان دەیان وت: کوڕی خودایە، دەشیان وت: یەکێکە لە سیانەکە، خودای گەورە پاکو بێ عەیبەو دورە لەو قسانەی ئەوان دەیانکرد. ئەو قسانەی کە مەسیحیەکان دەیان کردە بەڵگە دەیان وت: عیسا خودایە، چونکە مردوی زیندوو دەکردەوە کوێری زکماکو بەڵەکو نەخۆشی چاك دەکردەوە، هەواڵی بە شتە نادیارەکان ئەداو لە قوڕ لە شێوەی باڵندەی دروست دەکردو فوی پێدا دەکرد دەبوو بە باڵندە (ئەمانە هەموو بە فەرمانی خودا بوو. تا بیکاتە بەڵگە بۆ خەڵکی) بەڵگەشیان بۆئەوە کە دەیان وت: کوڕی خودایە ئەوەبوو دەیان وت: باوکی نەبووە فێری بکات، هەر لە بێشکەدا باسی شتێکی کردوە کە هیچ کەسێ لە نەوەی ئادەم نەیکردوە لە پێش ئەودا. بەڵگەشیان ئەوەبوو، دەیان وت: کە یەکێکە لە سیانەکە کە خودای مەزن فەرموویەتی: کردمان، فەرمانمان دا، دروستمان کرد، بڕیارمان دا، دەڵێن: ئەگەر یەك کەس بوایە دەیوت: کردم، فەرمانم دا، دروستم کرد، بڕیارم دا. لەبەر ئەوە عیساو مەریەمو خودان (خودای گەورە پاكو بێ عەیبەو دوورە لەوەی ئەو ستەمکارو خوانەناسانە دەیڵێن. لەسەر ئەو هەموو قسانەی ئەوانە کردوویانە خودا قورئانی ناردۆتە خوارەوە) پاشان ئیبنوئیسحاق لە تەفسیرەکەیدا، وتی: کاتێ کە پێغەمبەری خودا (ﷺ) هەواڵی پێدرا لە لایەن خوداوە بۆ جیاکردنەوەی ئەو بڕیارە لە نێوان پێغەمبەرو (ﷺ) ئەواندا‌و فەرمانیدا بە نەفرین لێکردنیان ئەگەر ئەو بڕیارەیان قبوڵ نەکرد لێی، پێغەمبەری خودا(ﷺ) بانگی کردن بۆ نزاو نەفرین کردن، وتیان: ئەی ئەبولقاسم، مۆڵەتمان بدە با سەیری بڕیارەکەمان بکەین، پاشان دێینەوە لاتو ئەوەی دەمانەوێ دەربارەی ئەوەی کە تۆ بانگت کردوین بۆی دەیکەین. لە لای هەڵسانو ڕۆشتن، پاشان چوونەوە بۆ لای عاقیب کە ڕاوێژپێکراویان بوو وتیان: ئەی عەبدولمەسیح تۆ ڕات چیە؟ وتی: سوێند بە خوا ئەی دەستەی مەسیحیەکان، خۆتان چاك دەزانن موحەممەد(ﷺ) پێغەمبەرێکی ڕاسپاردەیە، هەواڵی تەواوی پێداون دەربارەی هاوەڵەکەتان (عیسا)، دەشزانن کە هیچ پێغەمبەرێ هەرگیز نەفرینی لە هۆزێ نەکردوە مەگین گەورەو بچوکیان لەناوچووە، ئەگەر کاری وا بکەن بنەبڕ

دەبن. ئەگەر ئێوە دەتانەوێ لەسەر ئاینی خۆتان بمێننو لەسەر ئەو قسەیە بمێننەوە کە لەبارەی هاوەڵەکەتانەوە (عیسا) وتویانە: خوا حافیزی لەو پیاوە بکەنو بگەڕێنەوە بۆ وڵاتی خۆتان. هاتن بۆ لای پێغەمبەر (ﷺ) وتیان: ئەی ئەبولقاسم بڕیارمان دا نزاو نەفرینت لەگەڵ نەکەین، لەسەر ئاینی خۆت بەجێت دەهێڵین، لەسەر ئاینی خۆمان دەگەڕێینەوە. بەڵام لە هاوەڵەکانت لەگەڵمان بنێرە کە خۆت لێیان ڕازیبیت ، فەرمانڕەوایی بکات لەو شتانەی کە ئێمە کێشەمان دەبێت لەسەری لەماڵو سامانماندا، ئێوە جێی ڕەزامەندین لە لای ئێمە[1] بوخاری ڕیوایەتی کردوە لە حوزەیفەوە (ڕەزای خوای لێ بێ) وتی: عاقیبو سەید کە بەرپرسی نەجرانیەکان بوون چوون بۆ لای پێغەمبەری خودا (ﷺ) ویستیان نزاو نەفرین لەگەڵ پێغەمبەرا بکەن. وتی: یەکێکیان وتی بە هاوەڵەکەی شتی وا نەکەی، سوێند بە خوا ئەگەر پێغەمبەر بێو نزاو نەفرینی لەگەڵا بکەین ئێمە ڕزگارمان نابێو لە دوای خۆمان کەسیشمان نامێنێ. هەردووکیان وتیان: (ئەی موحەممەد(ﷺ)) هەرچیمان لێ داوا بکەی پێت ئەدەین. پیاوێکی دڵسۆزمان (دەسپاك) لەگەڵا بنێرە، جگە لە پیاوێکی ئەمین کەسی ترمان لەگەڵا مەنێرە. پێغەمبەر (ﷺ) فەرمووی: (کەسێکتان لەگەڵا ڕەوانە دەکەم کە ئەمینەو بەڕاستی ئەمینە) هاوەڵەکانی پێغەمبەری خودا (ﷺ) سەیریان دەکردو چاوەڕوان بوون. فەرمووی: (ئەی ئەبوعوبەیدەی کوڕی جەڕاح هەڵسە) کاتێ کە هەڵسا پێغەمبەری خودا (ﷺ) فەرمووی: (ئەمە ئەمینی ئەم ئوممەتەیە)[2] بوخاری ڕیوایەتی کردوە لە ئەنەسەوە لە پێغەمبەری خوداوە (ﷺ) فەرموویەتی: (هەموو ئوممەتێك ئەمینێکی هەیە، ئەمینی ئەم ئوممەتە ئەبوعوبەیدەی کوڕی جەڕاحە)[3] ئیمامی ئەحمەد ڕیوایەتی کردوە لە ئیبنوعەبباسەوە، وتی: ئەبوجەهل خوا ڕووی ڕەشکا، وتی: ئەگەر موحەممەدم بینی لە لای کەعبەدا نوێژ بکات دێم بۆیو پێ دەخەمە سەر ملی. وتی: پێغەمبەری خودا (ﷺ) فەرمووی: (ئەگەر ئەوەی بکردایە بە ئاشکرا فریشتەکان هەڵیان دەگرت (دەیانگرت) ئەگەر جوولەکەیش خۆزگەی مردنیان بخواستایە دەمردنو شوێنی خۆیشیان لە ئاگرا دەبینی، ئەگەر ئەوانە دەرچوونایە کە دەیان ویست موباهەلە لەگەڵ پێغەمبەرا (ﷺ) بکەن دەگەڕانەوە، نە ماڵو سامانو نە کەسو کاریان نەدەبینیەوە).[4] بوخاریو تیرمیزیو نەسائی ڕیوایەتیان کردووە[5] تیرمیزی وتی:

---

[1] إبن هشام (٢/٢٣٣).

[2] فتح الباري (٧/٦٩٥).

[3] فتح الباري (٧/٦٩٦).

[4] أحمد (١/٢٤٨)، سەحیحە.

[5] فتح الباري (٨/٥٩٥)، تحفة الاحوذي (٩/٧٧)، النسائي في الكبرى (٦/٥١٨).

فەرموودەیەکی حەسەنی سەحیحە. پاشان خودای مەزن دەفەرمووێت: ﴿إِنَّ هَٰذَا لَهُوَ الْقَصَصُ الْحَقُّ﴾ هیچ گومانت تێدا نەبێ، ئەوانەی بۆت باس کراوون، هەموو ڕاستن. واتە: ئەو بەسەرهاتەی کە بۆمان باس کردی ئەی موحەممەد (ﷺ) دەربارەی عیسا (سەلامی خوای لێ بێ) هەر ئەوە ڕاستەو هیچ گومانی تێدا نیە ﴿وَمَا مِنْ إِلَٰهٍ إِلَّا اللَّهُ وَإِنَّ اللَّهَ لَهُوَ الْعَزِيزُ الْحَكِيمُ﴾ هیچ پەرستراوێك جگە لە خوا نیەو دەبێ هەر ئەو بپەرسترێ. هەر خودایە کە خاوەنی دەستەڵاتەو لەکارزانە. ﴿فَإِن تَوَلَّوْا فَإِنَّ اللَّهَ عَلِيمٌ بِالْمُفْسِدِينَ﴾ ئەگەر هەر خۆیان لێ بواردی، خودا خۆی خراپەکاران دەناسێ. واتە: ئەگەر لە هەق لایانداو بەرەو ڕێگەی پڕوپوچ ڕۆشتن، ئەوانە خراپەکارنو خوا باش دەیانناسێو بەو زوانە لەسەر ئەو کارەیان خودا خراپترین سزایان ئەدا، ئەمە خودایە کە بەتوانایەو هیچی لێ ون نابێ، پاکیو بێ عەیبیو ستایش هەر بۆ ئەوە، پەنا بە خودا دەگرین لە دابەزینی تۆڵەی.

﴿قُلْ يَا أَهْلَ الْكِتَابِ تَعَالَوْا إِلَىٰ كَلِمَةٍ سَوَاءٍ بَيْنَنَا وَبَيْنَكُمْ أَلَّا نَعْبُدَ إِلَّا اللَّهَ وَلَا نُشْرِكَ بِهِ شَيْئًا وَلَا يَتَّخِذَ بَعْضُنَا بَعْضًا أَرْبَابًا مِّن دُونِ اللَّهِ ۚ فَإِن تَوَلَّوْا فَقُولُوا اشْهَدُوا بِأَنَّا مُسْلِمُونَ ﴿٦٤﴾﴾

**مەسەلەی خواپەرستی بەتەنیا لەلای هەمووان ئاشکرایە**

ئەم وتارە گشت ئەهلی کتێب دەگرێتەوە، لە جوولەکەو مەسیحیەکانو ئەوانیش ڕێڕەوی تاوانیان گرتۆتە بەر، وەك خودای مەزن دەفەرمووێت: ﴿قُلْ يَا أَهْلَ الْكِتَابِ تَعَالَوْا إِلَىٰ كَلِمَةٍ سَوَاءٍ بَيْنَنَا وَبَيْنَكُمْ﴾ بڵێ: ئێوەی ئەهلی کتێب، دەسا وەرن ئێمەو ئێوە لەسەر ئەو قسەیە سوور بینو کە بۆ هەمووان وەك یەکە. (الکلمة) بەکاردەهێنرێ بۆ ڕستەی تەواو. وەك لێرەدا فەرموویەتی: ﴿أَلَّا نَعْبُدَ إِلَّا اللَّهَ وَلَا نُشْرِكَ بِهِ شَيْئًا﴾ جگە لە خودا نەپەرستینو هاوکاری بۆ پەیدا نەکەین لە هیچ شتێکدا. واتە: بتو پەیکەرو خاچو تاغوتو ئاگرو هیچ شتێکی تر نەپەرستینو تەنیا خودا بپەرستین کە شەریکی نیە، ئەمەیش بانگەوازی گشت پێغەمبەرانە (سەلامی خوایان لێ بێ) خودای گەورە دەفەرمووێت: ﴿وَمَا أَرْسَلْنَا مِن قَبْلِكَ مِن رَّسُولٍ إِلَّا نُوحِي إِلَيْهِ أَنَّهُ لَا إِلَٰهَ إِلَّا أَنَا فَاعْبُدُونِ﴾[1] بەر لە تۆش ئێمە هەر پێغەمبەرێکمان نارد، ڕامان سپارد، کە هیچ پەرستوویەك جگە لە من نیە، هەر تەنیا من بپەرستن. هەروەها فەرموویەتی: ﴿وَلَقَدْ بَعَثْنَا فِي كُلِّ أُمَّةٍ رَّسُولًا أَنِ اعْبُدُوا اللَّهَ وَاجْتَنِبُوا

---

[1] الانبیاء (۲۵).

ٱلطَّٰغُوتَ ﴾[1] بۆ ناو هەموو كۆمەڵێك پێغەمبەرێكمان بەڕێ كرد، كە خودا بپەرستن‌و لە شەیتان (تاغوت) دوورەپەرێز بن. پاشان لێرەدا دەفەرمووێت: ﴿وَلَا يَتَّخِذَ بَعْضُنَا بَعْضًا أَرْبَابًا مِّن دُونِ ٱللَّهِ﴾ نەچین هەندێكمان هەندێكی (جگە لە خودا) بۆ پەرستن هەڵبژێرین. ئیبنوجورەیج وتی: واتە: هەندێكمان بە گوێی هەندێكی بكات لە سەرپێچی خوادا ﴿فَإِن تَوَلَّوْا فَقُولُوا ٱشْهَدُوا بِأَنَّا مُسْلِمُونَ﴾ جا ئەگەر هەر خۆیان لێ بوارد، پێیان بڵێ: ئێوە بە شایەت دەگرم، كە وا ئێمە خۆمان بە خودا دەسپێرین. واتە: ئەگەر پشتیان هەڵكرد لەو ڕاستیەو ئەم بانگەوازە، بیانكەنە شایەت كە ئێوە هەر لەسەر ئەم ئیسلامە دەڕۆین‌و بەردەوامن كە خودا بڕیاری داوە بۆتان. لەو نامەیەدا كە پێغەمبەر ناردی بۆ هیرەقل (هِرَقل) گەورەی ڕوم فەرمووی: (بەناوی خودای دەهەندەی دلۆڤان، لە موحەممەد پێغەمبەری خوداوە بۆ هیرەقل گەورەی ڕوم! سڵاو لەو كەسەی شوێنی ڕاستی دەكەوێ، (أمّا بعد)، موسوڵمان ببە دڵنیا دەبی، كە موسوڵمان ببی خودا دووجار پاداشتت ئەداتەوە، ئەگەر خۆشت ببویری. ئەوسا گوناهی ژێر دەستەكانیشت دەكەوێتە سەر ﴿قُلْ يَٰٓأَهْلَ ٱلْكِتَٰبِ تَعَالَوْا إِلَىٰ كَلِمَةٍ سَوَآءٍۭ بَيْنَنَا وَبَيْنَكُمْ أَلَّا نَعْبُدَ إِلَّا ٱللَّهَ وَلَا نُشْرِكَ بِهِۦ شَيْـًٔا وَلَا يَتَّخِذَ بَعْضُنَا بَعْضًا أَرْبَابًا مِّن دُونِ ٱللَّهِ ۚ فَإِن تَوَلَّوْا فَقُولُوا ٱشْهَدُوا بِأَنَّا مُسْلِمُونَ﴾ ئەی ئەهلی كتێب وەرن ئێمەو ئێوە لەسەر ئەو قسەیە سوور بین كە بۆ هەموومان وەك یەكە. بێجگە لەخوانەپەرستین، هاوەڵی بۆ پەیدا نەكەین، نەچین هەندێكمان هەندێكی (جگە لە خودا) بۆ پەرستن هەڵبژێرین. جا ئەگەر هەر خۆیان لێ بوارد، پێیان بڵێ: ئێوە بە شایەت دەگرم، كە وا ئێمە خۆمان بە خودا دەسپێرین. موحەممەدی كوڕی ئیسحاق‌و كەسانی تریش باسیان كردوە كە: لە سەرەتای سورەتی ئالی عیمران هەتا زیاتر لە هەشتا ئایەتی لەسەر شاندی نەجران هاتۆتە خوارەوە. زوهری وتی: ئەوانە یەكەم كەس بوون كە سەرانەیان (الجزية) دا. جیاوازی نیە (لە نێوان زانایاندا) كە ئایەتی سەرانە دوای فەتحی مەككە هاتۆتە خوارەوە. كەواتە چۆن نووسینی ئەم ئایەتە لە پێش فەتحا بۆ هیرەقل لەناو ئەو نامەیەدا (كە ڕەوانە كرا) ڕێكخرێ لەگەڵ ئەو باسەدا كە موحەممەدی كوڕی ئسحاق‌و زوهری كردویانە؟ وەڵامەكەی، هاتنی شاندی نەجران لە پێش حودەیبیەدا بوو. بەڵام ئەوەی كە شاندەكە بەخشیان بۆ ئاشتەوایی بوو لەو موباهەلەیە، نەك سەرانەدان، بەڵكو لە بری ڕێكەوتن‌و ئاشت بوونەوە بوو، هاتنە خوارەوەی ئایەتی سەرانە سەندن ڕێكەوتی كردوە دوای ئەوە بەو شێوەیە، وەك چۆن فەرزی پێنج یەك‌و چوار بەش لە پێنج بەش كراوە، بەو شێوەی عەبدوڵلای كوڕی جەحش كردی لەو پۆلەی سوپادا (السرية) پێش بەدر، پاشان فەرزی دابەش كردن هاتە خوارەوە بەو شێوەیە.

---

[1] النحل (٣٦).

هەڵیشدەگرێ کە پێغەمبەری خودا کاتێ فەرمانی دا بە نوسینی ئەوە لە نامەیەکدا بۆ هیرەقل، کە هێشتا دانەبەزیبێ، پاشان قورئان هاتبێتە خوارەوە ڕێکەوتبێ لەگەڵ ئەوەی پێغەمبەردا (ﷺ)وەك چۆن قورئان هاتە خوارەوە دەربارەی بالاپۆشی (الحجاب) دیلەکان و نوێژ نەکردن لەسەر دووڕووەکان هاوکات لەگەڵ قسەی عومەری کوڕی خەتاب داو ئەم ئایەتە کە خودای مەزن دەفەرمووێت: ﴿وَاتَّخِذُوا مِن مَّقَامِ إِبْرَاهِيمَ مُصَلًّى﴾[1] جێی ئیبراهیم بکەن بە نوێژگەی (سوێنی نوێژی) خۆتان. ئەم ئایەتەیش کە دەفەرمووێت: ﴿عَسَىٰ رَبُّهُ إِن طَلَّقَكُنَّ أَن يُبْدِلَهُ أَزْوَاجًا خَيْرًا مِّنكُنَّ﴾[2] ئەگەر ئێوە تەلاق بدا، لەوانەیە پەروەردگاری ئەو، ژنانی لە ئێوە باشتری (لە باتی ئێوە) بداتێ. هەر هاوکات بووە لەگەڵ قسەی عومەردا (ڕەزای خوای لێ بێ).

﴿ يَا أَهْلَ الْكِتَابِ لِمَ تُحَاجُّونَ فِي إِبْرَاهِيمَ وَمَا أُنزِلَتِ التَّوْرَاةُ وَالْإِنجِيلُ إِلَّا مِن بَعْدِهِ ۚ أَفَلَا تَعْقِلُونَ ﴿٦٥﴾ هَا أَنتُمْ هَٰؤُلَاءِ حَاجَجْتُمْ فِيمَا لَكُم بِهِ عِلْمٌ فَلِمَ تُحَاجُّونَ فِيمَا لَيْسَ لَكُم بِهِ عِلْمٌ ۚ وَاللَّهُ يَعْلَمُ وَأَنتُمْ لَا تَعْلَمُونَ ﴿٦٦﴾ مَا كَانَ إِبْرَاهِيمُ يَهُودِيًّا وَلَا نَصْرَانِيًّا وَلَٰكِن كَانَ حَنِيفًا مُّسْلِمًا وَمَا كَانَ مِنَ الْمُشْرِكِينَ ﴿٦٧﴾ إِنَّ أَوْلَى النَّاسِ بِإِبْرَاهِيمَ لَلَّذِينَ اتَّبَعُوهُ وَهَٰذَا النَّبِيُّ وَالَّذِينَ آمَنُوا ۗ وَاللَّهُ وَلِيُّ الْمُؤْمِنِينَ ﴿٦٨﴾﴾

**کێشە نانەوەی جوولەکەو لەسەر ئاینی ئیبراهیمی خەلیل (سەلامی خوای لێ بێ)**

خودای مەزن بێزاری خۆی دەردەبڕێ لە جوولەکەو گاورەکان کە کێشە دەکەن لە بارەی ئیبراهیمەوە (سەلامی خوای لێ بێ) کە هەردووکیان دەڵێن ئیبراهیم لە ئێمەیە. وەك موحەممەدی کوڕی ئیسحاق ڕیوایەتی کردوە لە ئیبنوعەبباسەوە (ڕەزای خوایان لێ بێ) وتی: مەسیحی نەجران و زاناکانی جوولەکە لە لای پێغەمبەری خودا کۆ بوونەوەو لەناو خۆیاندا کێشەیان هەبوو. زانا جوولەکەکان دەیان وت: ئیبراهیم هەر جوولەکە بوو. مەسیحیەکانیش دەیان وت: ئیبراهیم هەر مەسیحی بووە. خودای گەورە ئەم ئایەتەی ناردە خوارەوەو فەرمووی: ﴿ يَا أَهْلَ الْكِتَابِ لِمَ تُحَاجُّونَ فِي إِبْرَاهِيمَ وَمَا أُنزِلَتِ التَّوْرَاةُ وَالْإِنجِيلُ إِلَّا مِن بَعْدِهِ ۚ أَفَلَا تَعْقِلُونَ ﴾ئەی ئەهلی کتێب! ئێوە بۆ چی لە بارەی ئیبراهیمەوە کێشە دەکەن؟ دەشزانن تەورات و ئینجیلیش (هەردوویان) لە پاش زەمانی ئیبراهیم هاتوونە خوار، دە ئاخر بۆچی تێ ناگەن؟ واتە: ئەی جوولەکە چۆن دەڵێن ئیبراهیم جوولەکە بووە، کاتێ ئەو لە پێش دابەزینی تەورات بووە لەسەر مووسا (سەلامی خوای لێ بێ)؟ئەی مەسیحیەکان چۆن

---

[1] البقرة (١٢٥).

[2] التحريم (٥).

دەڵێن ئیبراهیم مەسیحی بووە. مەسیحیەت دوای ماوەیەکی زۆر پەیدا بووە؟[1] هەر بۆیە خودای مەزن دەفەرموێت: ﴿أَفَلَا تَعْقِلُونَ﴾ دەی بۆ تێ ناگەن. پاشان خودای گەورە دەفەرموێت: ﴿هَٰأَنتُمْ هَٰؤُلَاءِ حَاجَجْتُمْ فِيمَا لَكُم بِهِ عِلْمٌ فَلِمَ تُحَاجُّونَ فِيمَا لَيْسَ لَكُم بِهِ عِلْمٌ﴾ وامان دانا کە ئێوە دەتوانن لەسەر ئەو شتانە کێشە بکەن کە دەزانن، دەی بۆچی کێشە لەسەر شتێ دەکەن کە هیچی لێ نازانن؟ ئەمە بێزاری دەربڕینە بەرانبەر ئەو کەسانەی کە نایزانن کێشە دەکەن. چونکە جوولەکەو مەسحیەکان لە نێوان خۆیاندا کێشەیان بوو دەربارەی ئیبراهیم بەبێ زانیاری. خۆ ئەگەر کێشەیان لەسەر ئاینەکانی خۆیان بکردایە کە لەبەر دەستیاندایەو زانیاریان لەسەری هەبوو کە بۆیان هاتبوو هەتا هاتنی موحەممەد (ﷺ) ئەوە زۆر چاکتر بوو بۆیان. بەڵام ئەوان قسەیان لە شتێ دەکرد کە هیچیان لێ نەدەزانی. خودایش بێزاری خۆی دەردەبڕێ دەربارەیان و فەرمانیان پێدەکات کە ئەو شتانەی ئەوان نایزانن بیگێڕنەوە بۆ لای ئەو خودایە کە ئاگاداری نهێنیو ئاشکراکانەو حەقیقەتەکەی دەزانێ، هەر بۆیە خودای مەزن دەفەرموێت: ﴿وَاللَّهُ يَعْلَمُ وَأَنتُمْ لَا تَعْلَمُونَ﴾ هەر خودایە هەموو شت دەزانێ، ئێوە هیچی لێ نازانن. پاشان دەفەرموێت: ﴿مَا كَانَ إِبْرَاهِيمُ يَهُودِيًّا وَلَا نَصْرَانِيًّا وَلَٰكِن كَانَ حَنِيفًا مُّسْلِمًا وَمَا كَانَ مِنَ الْمُشْرِكِينَ﴾ ئیبراهیم نە مووسایی بوو نە مەسیحی، بەڵام یەکتاپەرستێك بوو، خۆی بە خودا سپاردبوو، هیچ شەریکی بۆ خودا پەیدا نەکرد. ئەم ئایەتە وەك ئەو ئایەتە وایە کە لە سورەتی (بەقەرە)دا باسی کرا کە خودای مەزن دەفەرموێت: ﴿وَقَالُوا كُونُوا هُودًا أَوْ نَصَارَىٰ تَهْتَدُوا﴾[2] وتیان: ببنە جوولەکە یان گاور هەتا بکەونە سەر ڕێی ڕاست. پاشان خودای مەزن دەفەرموێت: ﴿إِنَّ أَوْلَى النَّاسِ بِإِبْرَاهِيمَ لَلَّذِينَ اتَّبَعُوهُ وَهَٰذَا النَّبِيُّ وَالَّذِينَ آمَنُوا ۗ وَاللَّهُ وَلِيُّ الْمُؤْمِنِينَ﴾ ئەو کەسانەی لە هەموو کەس لە ئیبراهیم نزیکترن، ئەوانەن کە ئەوسا شوێنی ئەو کەوتنو ئەو پێغەمبەرەو ئەوانەشی کە بڕوایان پێ هێناوە، خوداش دۆستی هەموو خاوەنباوەڕانە. چاکترین کەس، ئەوانەن کە شوێنی ئیبراهیم کەوتوونو پەیڕەوی ئاینەکەیان کردوەو ئەو پێغەمبەرەیش کە موحەممەدەو (ﷺ) هاوەڵە خاوەن باوەڕەکانیەتی لە کۆچەریو ئەنساریەکانو ئەوانەش دوای ئەوان کەوتوون. سەعیدی کوڕی مەنسور ڕیوایەتی کردوە لە ئیبنومەسعودەوە (ڕەزای خوای لێ بێ) کە پێغەمبەری خودا (ﷺ) فەرموویەتی: (هەموو پێغەمبەرێ دۆستێکی بوو لەناو پێغەمبەراندا، دۆستی من لەنێوانیاندا ئیبراهیمی باوکمەو

---

[1] الطبري (٦/٤٩٠).

[2] البقرة (١٣٥).

خەلیلی پەروەردگاری مەزن). پاشان ئەم ئایەتەی خوێند: ﴿إِنَّ أَوْلَى ٱلنَّاسِ بِإِبْرَٰهِيمَ لَلَّذِينَ ٱتَّبَعُوهُ﴾[1] ئەو کەسانەی کە لە هەموو کەسێ لە ئیبراهیم نزیکن، ئەوانەن کە ئەوسا شوێنی ئەو کەوتن. ﴿وَٱللَّهُ وَلِيُّ ٱلْمُؤْمِنِينَ﴾ خودا دۆستی هەموو خاوەن باوەڕانە کە بڕوایان بە گشت پێغەمبەران هەیە (سەلامی خوایان لێ بێ).

﴿وَدَّت طَّآئِفَةٌ مِّنْ أَهْلِ ٱلْكِتَٰبِ لَوْ يُضِلُّونَكُمْ وَمَا يُضِلُّونَ إِلَّآ أَنفُسَهُمْ وَمَا يَشْعُرُونَ ﴿٦٩﴾ يَٰٓأَهْلَ ٱلْكِتَٰبِ لِمَ تَكْفُرُونَ بِـَٔايَٰتِ ٱللَّهِ وَأَنتُمْ تَشْهَدُونَ ﴿٧٠﴾ يَٰٓأَهْلَ ٱلْكِتَٰبِ لِمَ تَلْبِسُونَ ٱلْحَقَّ بِٱلْبَٰطِلِ وَتَكْتُمُونَ ٱلْحَقَّ وَأَنتُمْ تَعْلَمُونَ ﴿٧١﴾ وَقَالَت طَّآئِفَةٌ مِّنْ أَهْلِ ٱلْكِتَٰبِ ءَامِنُوا۟ بِٱلَّذِىٓ أُنزِلَ عَلَى ٱلَّذِينَ ءَامَنُوا۟ وَجْهَ ٱلنَّهَارِ وَٱكْفُرُوٓا۟ ءَاخِرَهُۥ لَعَلَّهُمْ يَرْجِعُونَ ﴿٧٢﴾ وَلَا تُؤْمِنُوٓا۟ إِلَّا لِمَن تَبِعَ دِينَكُمْ قُلْ إِنَّ ٱلْهُدَىٰ هُدَى ٱللَّهِ أَن يُؤْتَىٰٓ أَحَدٌ مِّثْلَ مَآ أُوتِيتُمْ أَوْ يُحَآجُّوكُمْ عِندَ رَبِّكُمْ قُلْ إِنَّ ٱلْفَضْلَ بِيَدِ ٱللَّهِ يُؤْتِيهِ مَن يَشَآءُ وَٱللَّهُ وَٰسِعٌ عَلِيمٌ ﴿٧٣﴾﴾

## ئیرەیی بردنی جوولەکە بە موسولمانان و فرۆفێڵیان

﴿وَدَّت طَّآئِفَةٌ مِّنْ أَهْلِ ٱلْكِتَٰبِ لَوْ يُضِلُّونَكُمْ وَمَا يُضِلُّونَ إِلَّآ أَنفُسَهُمْ وَمَا يَشْعُرُونَ﴾ هەندێك لە خاوەن کتێبان دەیانویست ئێوە لە ڕێگە لابدەن، کەچی ئەمانە نازانن کە هەر ڕێ لە خۆ دەگرن. خودای گەورە باسی ئیرەیی (حەسوودی) جوولەکە دەکات بەرانبەر بە خاوەن باوەڕان. کەچی هەست ناکەن کە ئاکامی خراپی ئەو کارەیان بۆ خۆیان دەگەڕێتەوە، پاشان خودای گەورە باسی خراپی ئەو کارە ناپەسەندەیان دەکات و دەفەرمووێت: ﴿يَٰٓأَهْلَ ٱلْكِتَٰبِ لِمَ تَكْفُرُونَ بِـَٔايَٰتِ ٱللَّهِ وَأَنتُمْ تَشْهَدُونَ﴾ ئەهلی کتێب، بۆچی ئێوە حاشا لە نیشانەکانی خودا دەکەن، کە هەرچەندە دەشزانن بەبێگومان ڕاستن، ﴿يَٰٓأَهْلَ ٱلْكِتَٰبِ لِمَ تَلْبِسُونَ ٱلْحَقَّ بِٱلْبَٰطِلِ وَتَكْتُمُونَ ٱلْحَقَّ وَأَنتُمْ تَعْلَمُونَ﴾ ئەهلی کتێب چۆن ڕەوا بە ناڕەوا دادەپۆشن. ڕاست و ڕەوا دەشارنەوە، دەشزانن چی دەکەن. واتە: ئەو شتانەی دەربارەی موحەممەد (ﷺ) لە کتێبەکانتاندایە لە سیفەتەکانی دەیشارنەوە. کەچی خۆتان زۆر چاك ئەوە دەزانن و گومانتان تێیدا نیە. ﴿وَقَالَت طَّآئِفَةٌ مِّنْ أَهْلِ ٱلْكِتَٰبِ ءَامِنُوا۟ بِٱلَّذِىٓ أُنزِلَ عَلَى ٱلَّذِينَ ءَامَنُوا۟ وَجْهَ ٱلنَّهَارِ وَٱكْفُرُوٓا۟ ءَاخِرَهُۥ﴾ ئەوانەی ئەهلی کتێبن هەندێکیان بە هەندێکی تریان دەڵێن: ئێوە لە کاتی بەیانی بڵێن: بڕوامان هێناوە بەوەی کە خودا بۆ ئێوەی ناردوە، سەر لە ئێوارە لێیان پەشیمان ببنەوە. ئەوەیش فێڵ و تەڵەکەیەك بوو، بۆ ئەوەی ئەو خەڵکە کە سادەو لاوازن ئاینەکەیان لێ

---

[1] سعيد بن منصور (٣/١٠٤٧).

بشێوێنن‌و لێیان تێك بدەن. بچنە ناو موسوڵمانان لە سەرەتای بەیانیدا بڕوا بێنن‌و لەگەڵیاندا نوێژی بەیانی بکەن، کە ئێوارە دامات پەشیمان ببنەوەو بچنەوە سەر ئاینەکەی خۆیان. بۆ ئەوەی ئەو خەڵکەی کە نەفامن، بڵێن: بۆیە گەڕانەوە بۆ ئاینەکەی خۆیان، دەزانن‌و ئاگادارن کە ئاینی ئەم موسوڵمانانە کەمی‌و کوڕیی تێدایەو عەیبدارە، بۆیە وتویانە وەك خودای گەورە دەفەرموێت: ﴿لَعَلَّهُمۡ يَرۡجِعُونَ﴾ بەڵکو ئەوانیش پەشیمان ببنەوەو وەرگەڕێن لە ئاینەکەیان. ئیبنوئەبی نەجیح وتی: لە موجاهیدەوە، خودا بەم ئایەتە باسی ئەم جوولەکانەی کردوە. واتە: جوولەکە نوێژی بەیانی کردوە لەگەڵ پێغەمبەرا (ﷺ)سەر لە ئێوارە حاشای کردووەو پەشیمان بووەتەوەو فێڵی کردووە، تا پیشانی خەڵکی بدەن کە ئەمانە بۆیان دەرکەوتووە ئەم ئاینە ئاینێکی ڕاست نەبووە ئەمانە شوێنی کەوتبوون.[1] ﴿وَلَا تُؤۡمِنُوٓاْ إِلَّا لِمَن تَبِعَ دِينَكُمۡ﴾ پێشیان وتوون: باوەڕ هەر بەوانە بکەن کە لەسەر ئاینی خۆتانن. واتە: دڵنیا مەبن‌و نهێنی خۆتان‌و ئەو شتانەی دەیزانن ئاشکرای مەکەن بۆ هیچ کەسێ لەسەر ئاینی خۆتان نیە. واتە: ئەوەی دەیزانن ئاشکرای مەکەن بۆ موسوڵمانان، تا بڕوای پێ بکەن‌و بیکەنە بەڵگە بەسەرتانەوە، خودای گەورەیش دەفەرموێت: ﴿قُلۡ إِنَّ ٱلۡهُدَىٰ هُدَى ٱللَّهِ﴾ ئەی موحەممەد(ﷺ) بڵێ: ڕێ نیشاندان هەر ڕێنیشاندانی خودایە. واتە: هەر خودایە دڵی خاوەنباوەڕان شارەزا دەکات بەرەو باوەڕی بەتەو بەوەی کە خودا ڕەوانەی کردوە بۆ بەندەو پێغەمبەری خۆی موحەممەد (ﷺ) لەو نیشانەو بەڵگە بەهێزو ڕوون‌و ئاشکرانە، ئێوەش (ئەی جوولەکە) ئەوەی کە لەبەر دەستتاندایە لە سیفەتی ئەم پێغەمبەرە نەخوێندەوارە موحەممەد (ﷺ) شاردوتانەوە لە کتێبەکانتاندایە لە پێغەمبەرە پێشووەکانتان وەرگرتووە. خودای مەزن دەفەرموێت: ﴿أَن يُؤۡتَىٰٓ أَحَدٞ مِّثۡلَ مَآ أُوتِيتُمۡ أَوۡ يُحَآجُّوكُمۡ عِندَ رَبِّكُمۡ﴾ (وەك پێشوو شارەزای کردن) کەسێکی تریش وەك ئێوە شارەزاکا. ئەگەر وتیان: کێشەکەمان دەبەینە لای پەروەردگارتان. واتە: دەڵێن: ئەو زانیاریەی کە لاتانە دەری مەخەن بۆ موسوڵمانەکان، تا لە ئێوەوە فێری ببن، وتوێژتان لەگەڵا بکەن لەسەری خۆیان بەسەرتاندا هەڵکێشن لەبەر بەهێزی بڕوایان پێی. یان بیکەنە بەڵگە لە لای خودا لەسەرتان. واتە: ئەوەی کە لەلای خۆتانە بیکە بەڵگە بەسەرتانەوەو قسەتان نەمێنێ. لە دنیاو لە قیامەتدا بەڵگەتان لەسەر کۆ ببێتەوە. خودای مەزن دەفەرموێت: ﴿قُلۡ إِنَّ ٱلۡفَضۡلَ بِيَدِ ٱللَّهِ يُؤۡتِيهِ مَن يَشَآءُۗ﴾ بڵێ: چاکە بەدەس خودایە، دەیدات بە هەرکەسێ کە بیەوێت. واتە: هەموو کارێ لە ژێر دەستەڵاتی ئەودایە هەر خودا خۆی دەبەخشێ‌و دەشیگرێتەوە، بڕواو زانیاری‌و تێگەیشتنی تەواو ئەدا بە هەرکەسێ خۆی بیەوێ، مەیلیشی لە

[1] الطبري (٦/٥٠٨).

هەرکەسێ بوێ، گومڕاو کوێری دەکاتو دڵی دەمرێنێو مۆر دەنێ بە دڵو گوێیداو پەردەیش دێنێ بەسەر چاویدا. خودا خۆی باش دەزانێو لەکارزانە لە هەموو شتێکدا ﴿وَٱللَّهُ وَٰسِعٌ عَلِيمٌ﴾ خودا چاکە فراوانو زۆر زانایە. هەرکەسێ ئەو بیەوێ بەر بەزەیی خۆی دەخات، خودا چاکەی زۆرو گەورەی لەلایە. واتە: ئەی خاوەنباوەڕان خودا تایبەتمەندی کردوون بە چاکەیەك کە سنوری نیە، وەسفی پێغەمبەرەکەتانی وا کردوە کە ڕێزی داوە بەسەر هەموو پێغەمبەرەکاندا (سەلامی خوایان لێ بێ) بەهۆی ئەوەوە ڕێی نیشان داون بۆ پەیامو شەریعەت.

﴿وَمِنْ أَهْلِ ٱلْكِتَٰبِ مَنْ إِن تَأْمَنْهُ بِقِنطَارٍ يُؤَدِّهِۦٓ إِلَيْكَ وَمِنْهُم مَّنْ إِن تَأْمَنْهُ بِدِينَارٍ لَّا يُؤَدِّهِۦٓ إِلَيْكَ إِلَّا مَا دُمْتَ عَلَيْهِ قَآئِمًا ۗ ذَٰلِكَ بِأَنَّهُمْ قَالُوا۟ لَيْسَ عَلَيْنَا فِى ٱلْأُمِّيِّۦنَ سَبِيلٌ وَيَقُولُونَ عَلَى ٱللَّهِ ٱلْكَذِبَ وَهُمْ يَعْلَمُونَ ﴿٧٥﴾ بَلَىٰ مَنْ أَوْفَىٰ بِعَهْدِهِۦ وَٱتَّقَىٰ فَإِنَّ ٱللَّهَ يُحِبُّ ٱلْمُتَّقِينَ ﴿٧٦﴾﴾

## ڕوون کردنەوەی بارودۆخی ئەمانەتی جوولەکە

خودای مەزن باسی جوولەکە دەکات کە ناپاکیان زۆرە، خاوەن باوەڕان ئاگادار دەکاتەوە کە پێیان هەڵنەخەڵەتێنو دەفەرموێت: ﴿وَمِنْ أَهْلِ ٱلْكِتَٰبِ مَنْ إِن تَأْمَنْهُ بِقِنطَارٍ يُؤَدِّهِۦٓ إِلَيْكَ﴾ هەر لە ناو ئەهلی کتێبدا هی وا هەیە گەنجینەیەکی (قنطار) لەلا دانێی، بە دەس پاکی دەتداتەوە. واتە: هەرچەندە ماڵو سامانی لەلا دانێیت کەم بێ یان زۆر خەیانەتی لێ ناکات. ﴿وَمِنْهُم مَّنْ إِن تَأْمَنْهُ بِدِينَارٍ لَّا يُؤَدِّهِۦٓ إِلَيْكَ إِلَّا مَا دُمْتَ عَلَيْهِ قَآئِمًا﴾ هی واشیان هەیە دینارێکی پێ بسپێرە ناتداتەوە جا مەگین بەجێی نەهێڵیو هەڵێ پێچیو وازی لێ نەهێنی تا لێی وەردەگریتەوە. ئەگەر ئەمە کاری ئەمانە بێ لە دنیادا بۆ پارەیەکی کەم، ئەگەر ئەو ماڵە زۆر بێ دەبێ چی بکەن، هەرگیز پێت نادەنەوە. خودای گەورە دەفەرموێت: ﴿ذَٰلِكَ بِأَنَّهُمْ قَالُوا۟ لَيْسَ عَلَيْنَا فِى ٱلْأُمِّيِّۦنَ سَبِيلٌ﴾ بەهانەکەشیان ئەمەیە: زیان گەیاندن بەو نەخوێندەوارانە بۆ ئێمە هیچ تاوانێ نیە. واتە: ئەوەی پاڵیان پێوە دەنێ مل نەدانیانە بە هەق بۆیە دەڵێن: لە ئاینی ئێمەدا هیچ ڕێگریەك نیە لە خواردنی ماڵو سامانی نەخوێندەوارەکان. مەبەستیان پێی عەرەبەو دەڵێن خودا بۆی حەلاڵ کردووین. خودای گەورەیش دەفەرموێت: ﴿وَيَقُولُونَ عَلَى ٱللَّهِ ٱلْكَذِبَ وَهُمْ يَعْلَمُونَ﴾ درۆ بۆ خواش هەڵدەبەستن، دەشزانن درۆ دەکەن. چونکە خودا خواردنی ماڵو سامانی خەڵکی قەدەغە کردووە بە هەقی تایبەتی خۆی نەبێ. بەڵام ئەمانە گەلێکی بوختانچین. عەبدوڕەزاق ڕیوایەتی کردوە لە سەعسەعەی کوڕی یەزیدەوە کە پیاوێ پرسیاری لە ئیبنوعەبباس کردووە وتویەتی: ئێمە لە غەزادا تووشی ماڵو سامانی ئەهلی زیمە دێین لە مریشكو بزنو مێ. ئیبنوعەبباس وتی: ئێوە دەڵێن چی؟ وتی: دەڵێین: هیچ بەوە گوناهمان ناگا، ئیبنوعەبباس

وتی: ئەم قسەیەی ئێوە وەك قسەی ئەهلی کتێب وایە کە وتیان: ﴿قَالُوا لَيْسَ عَلَيْنَا فِي الْأُمِّيِّينَ سَبِيلٌ﴾ زیان گەیاندنمان بەو نەخوێندەوارانە بۆ ئێمە هیچ تاوانێ نیە. ئەوانە ئەگەر سەرانەیان دا ماڵیان بۆ ئێوە حەڵاڵ نیە مەگین بە ئارەزووی خۆیان بیدەن.[1] پاشان خودای مەزن دەفەرموێت: ﴿بَلَىٰ مَنْ أَوْفَىٰ بِعَهْدِهِ وَاتَّقَىٰ﴾ دیارە هەرکەس ترسی لە خودا هەبێو بەڵێنی بەرێتە سەر. واتە: ئەی ئەهلی کتێب هەرکەسێ لە ئێوە لە خوا بترسێو ئەو بەڵێنەی کە خودا لێی وەرگرتوون کە دەبێ بڕوا بێنن بەو موحەممەدە (ﷺ) کاتێ کە ڕەوانە کرا، وەك چۆن بەڵێنو پەیمانی لە گشت پێغەمبەرانو (سەلامی خوایان لێ بێ) گەلەکانیان وەرگرتووە لەو بارەیەوە، خۆشتان لە قەدەغەکراوەکان پاراستو لە شوێن پەیامی ئەو پێغەمبەرە ڕۆشتن(ﷺ) کە دواین پێغەمبەرەو بەڕێزترین مرۆڤی نەوەی ئادەمە ﴿فَإِنَّ اللَّهَ يُحِبُّ الْمُتَّقِينَ﴾ خودایش پارێزگارانو لە خواترسانی خۆش دەوێ.

﴿إِنَّ الَّذِينَ يَشْتَرُونَ بِعَهْدِ اللَّهِ وَأَيْمَانِهِمْ ثَمَنًا قَلِيلًا أُولَٰئِكَ لَا خَلَاقَ لَهُمْ فِي الْآخِرَةِ وَلَا يُكَلِّمُهُمُ اللَّهُ وَلَا يَنظُرُ إِلَيْهِمْ يَوْمَ الْقِيَامَةِ وَلَا يُزَكِّيهِمْ وَلَهُمْ عَذَابٌ أَلِيمٌ (٧٧)﴾

**ئەوانەی پەیمانیان شکاندوە لە ڕۆژی قیامەتدا هیچ بەشیان نیە**

﴿إِنَّ الَّذِينَ يَشْتَرُونَ بِعَهْدِ اللَّهِ وَأَيْمَانِهِمْ ثَمَنًا قَلِيلًا﴾ ئەوانەی پەیمانەکەیان لەگەڵ خوداو سوێندی خۆیان بە نرخێکی کەم دەفرۆشن. واتە: پەشیمان دەبنەوە لەو بڵێنو پەیمانە کە بە خودایان دابوو کە شوێنی موحەممەد (ﷺ)و باسی سیفەتەکانیو ئەو فەرمانەی کە پێی کراوە ڕوون بکەنەوە بۆ خەڵکیو سوێندی خۆیان شکاندو درۆیان کردو بە نرخێکی زۆر کەمی ئەم دنیا دوا کۆتایە فرۆشتیان ﴿أُولَٰئِكَ لَا خَلَاقَ لَهُمْ فِي الْآخِرَةِ﴾ ئەوانە لە ڕۆژی دوایدا هیچ بەشیان نیە. ﴿وَلَا يُكَلِّمُهُمُ اللَّهُ وَلَا يَنظُرُ إِلَيْهِمْ يَوْمَ الْقِيَامَةِ﴾ خودایش لە ڕۆژی قیامەتدا نایان دوێنێو سەیریان ناکات. واتە: بە وتەی بەسۆز نایان دوێنێو بە چاوی بەزەییش سەیریان ناکاتو بۆیان ناڕوانێ. ﴿وَلَا يُزَكِّيهِمْ﴾ واتە: لە گوناهو تاوان پاكو خاوێنیان ناکاتەوەو فەرمان دەکات بەرەو ئاگر بیان بەن. ﴿وَلَهُمْ عَذَابٌ أَلِيمٌ﴾ بەشیان جەزرەبەی بە ژانە. فەرموودەی زۆر هاتووە پەیوەندی بەم ئایەتە پیرۆزەوە هەیە، هەندێ لەو فەرموودانە باس دەکەین.

---

[1] عبدالرزاق (١٢٣/١).

**فەرموودەی یەکەم**

ئیمامی ئەحمەد لە ئەبوزەڕەوە ڕیوایەتی کردوە پێغەمبەری خودا (ﷺ) فەرموویەتی: (سێ کەس خودا نایان دوێنێ‌و بۆیان ناڕوانێ لە ڕۆژی قیامەتدا، لە گوناهیش پاکیان ناکاتەوەو بەشیان جەزرەبەی بە ژانە). وتم: ئەی پێغەمبەری خودا (ﷺ) ئەوانە کێن؟ ڕەنجەڕۆو زیانبار بوون. وتی: سێ جار ئەمەی خوێندەوە، فەرمووی: (ئەو کەسەی پۆشاکەکەی درێژ دەکات بۆ دامێنی بەمەبەستی فیز کردن. ئەو کەسەی بە سوێندی درۆ ڕەواج بە شمەکەکەی دەدات، ئەو کەسەی منەت بەسەر خەڵکا دەکات)[1] .

**فەرموودەی دووهەم**

ئیمامی ئەحمەد لە عەدی کوڕی عومەیری کندیەوە ڕیوایەتی کردوە وتی: ناکۆکی کەوتە نێوان ئەوو پیاوێك لە کندە ناوی ئومرئولقەیسی کوڕی عابیس بوو، پیاوێکی خەڵکی حەزرەمەوت بوو، کێشەکەیان هێنایە لای پێغەمبەری خودا (ﷺ)، کێشەکە لەسەر زەویەك بوو، فەرمانی دا بە پیاوە حەزرەمەوتیەکە بە شایەتو بەڵگە هێنان، بەڵگەو شایەتی نەبوو، فەرمانیدا بە ئومرئولقەیس بە سوێند خواردن. حەزرەمیەکە، وتی: ئەی پێغەمبەری خودا(ﷺ) ئەگەر سوێند بخوا بە پەروەردگاری کەعبە زەویەکەم دەبات. پێغەمبەر (ﷺ) فەرمووی: (هەرکەسێ سوێندێکی درۆ بخوات بۆ ئەوەیماڵ‌و سامانی کەسێ ببڕێ (بۆ خۆی) کە دەگات بە خودای مەزن، خودا لێی تووڕەو زویرە). ڕەجاء (کە یەکێکە لەو کەسانەی ئەم فەرموودەی ڕیوایەت کردوە) وتی: پێغەمبەری خودا (ﷺ) ئەم ئایەتەی خوێند: ﴿ إِنَّ ٱلَّذِينَ يَشْتَرُونَ بِعَهْدِ ٱللَّهِ وَأَيْمَـٰنِهِمْ ثَمَنًا قَلِيلًا ﴾ ئەوانەی پەیمانەکەیان لەگەڵ خوداو سوێندی خۆیان بە نرخێکی کەم دەفرۆشن. ئومرئولقەیس وتی: ئەی پێغەمبەری خودا (ﷺ) ئەوەی وازی لێ دەهێنێ چی بۆ هەیە؟ فەرمووی: (بەهەشت) ئومرئولقەیس وتی: تۆ شایەتبە، من هەموویم واز لێ هێنا بۆ ئەو[2].

**فەرموودەی سێهەم**

ئیمامی ئەحمەد لە عەبدوڵلاوە ڕیوایەتی کردوە وتی: پێغەمبەری خودا (ﷺ) فەرموویەتی: (هەرکەسێ سوێندێ بخوات لەو سوێندەدا درۆ بکات بۆ ئەوەی ماڵی کەسێکی موسوڵمانی پێ داگیر بکات، دێتە لای خودای مەزن، خودا لێی تووڕەو زویرە) ئەشعەس وتی: بەخودا ئەوە لە بارەی منەوە بوو. لە نێوان منو پیاوێکی جولەکەدا زەویەك هەبوو (کێشەمان بوو) ئەو حاشای لە مافی من دەکرد

---

[1] أحمد (١٤٨/٥)، سەحیحە.

[2] أحمد (١٩١/٤)، سەحیحە.

تێیدا، منیش بردم بۆ لای پێغەمبەری خودا (ﷺ)، فەرمووی: شایەتت هەیە؟ وتم: نەخێر، وتی بە جوولەکەکە تۆ سوێند دەخۆی (کە هی تۆیە) منیش وتم: ئەی پێغەمبەری خودا (ﷺ) ئەو سوێند دەخواو ماڵەکەم لە دەست دەچێ، خودای گەورەیش ئەم ئایەتەی ناردە خوارەوە: ﴿إِنَّ ٱلَّذِينَ يَشْتَرُونَ بِعَهْدِ ٱللَّهِ وَأَيْمَـٰنِهِمْ ثَمَنًا قَلِيلًا﴾[1] ئەوانەی پەیمانەکەیان لەگەڵ خوداو سوێندی خۆیان بە نرخێکی کەم دەفرۆشن. بوخاریو موسلیم لە هەردوو سەحیحەکەیاندا هێناویانە[2].

**فەرموودەی چوارەم**

ئیمامی ئەحمەد لە ئەبوهورەیرەوە ڕیوایەتی کردوە: پێغەمبەری خودا (ﷺ) فەرموویەتی: (سێ کەس خودا نایان دوێنێ لە ڕۆژی قیامەتداو بۆیان ناڕوانێو پاکیشیان ناکاتەوە لە گوناه. سزای بە ژانیش بەشیانە. پیاوێ ئاوی زیادەی خۆی گرتبێتەوە لە ڕێبوار، پیاوێ سوێندی خواردبێ لەسەر شمەکەکەی دوای عەسەر (یانی سوێنی درۆ) پیاوێکیش پەیمانی دابێ بە پێشەوایەك، ئەگەر خەڵاتی کرد پەیمانی بەجێ بێنێ، ئەگەر خەڵاتی نەکرد پەیمانەکەی بەجێ نەهێنێ)[3] تیرمیزیو ئەبوداودیش ڕیوایەتیان کردوە. تیرمیزی وتی: فەرموودەیەکی حەسەنی سەحیحە.[4]

﴿وَإِنَّ مِنْهُمْ لَفَرِيقًا يَلْوُۥنَ أَلْسِنَتَهُم بِٱلْكِتَـٰبِ لِتَحْسَبُوهُ مِنَ ٱلْكِتَـٰبِ وَمَا هُوَ مِنَ ٱلْكِتَـٰبِ وَيَقُولُونَ هُوَ مِنْ عِندِ ٱللَّهِ وَمَا هُوَ مِنْ عِندِ ٱللَّهِ وَيَقُولُونَ عَلَى ٱللَّهِ ٱلْكَذِبَ وَهُمْ يَعْلَمُونَ ﴿٧٨﴾﴾

**جوولەکە بە زمان گەڕاندن وتەی خوا دەگۆڕن**

﴿وَإِنَّ مِنْهُمْ لَفَرِيقًا يَلْوُۥنَ أَلْسِنَتَهُم بِٱلْكِتَـٰبِ لِتَحْسَبُوهُ مِنَ ٱلْكِتَـٰبِ وَمَا هُوَ مِنَ ٱلْكِتَـٰبِ﴾ هەر لەوانەدا (لەو جوولەکانە) هی واش هەیە، بە جۆرێك زمانیان دەگێڕن گوایە لە کتێبی خودا دەخوێننەوە کە لە کتێبەکەشدا نیە. خودای گەورە باسی جوولەکە دەکات بەر نەفرینی خودا کەون، کە هی وایان هەیە کتێبی خودا لە جێی خۆیدا دەگۆڕن، ئەو مەبەستەی کە خودا باسی کردوە لە جێگای خۆی لایدەبەنو دەیگۆڕن، هەتا ئەوانەی نەزانن وا تێ بگەن ئەوە قسەی خودایە. لە کتێبی خودایە. دەڵێن وتەی خودایە، کەچی ئەوە درۆیە بەدەم خوداوە دەیکەن. خۆشیان چاك دەزانن کە درۆ دەکەنو هەموو بوختانە بەدەم خوداوە دەیکەن. هەر بۆیە خودای گەورە دەفەرموێت:

---

[1] أحمد (٣٧٩/١)، سەحیحە.

[2] فتح الباري (٣٣٦/٥)، مسلم (١٢٢).

[3] أحمد (٣٧٩/١)، سەحیحە.

[4] أبوداود (٧٤٩/٣)، تحفة الاحوذي (٢١٨/٥).

﴿وَيَقُولُونَ هُوَ مِنْ عِندِ ٱللَّهِ وَمَا هُوَ مِنْ عِندِ ٱللَّهِ وَيَقُولُونَ عَلَى ٱللَّهِ ٱلْكَذِبَ وَهُمْ يَعْلَمُونَ﴾ دەڵێن: ئەمە خودا فەرموویەتی، کەچی خوداش نەیفەرمووە، خۆشیان ئەوە دەزانن کە درۆیەو بەدەم خوداوە هەڵی دەبەستن. موجاهیدو شەعبیو حەسەنو قەتادەو ڕەبیعی کوڕی ئەنەس دەڵێن: ﴿يَلْوُۥنَ أَلْسِنَتَهُم بِٱلْكِتَٰبِ﴾ واتە: دەیگۆڕن[1] بوخاریش هەر وا ڕیوایەتی کردوە لە ئیبنوعەبباسەوە کە کتێبی خودا دەگۆڕنو لێی زیاد دەکەن، هیچ کەسێ لە دروستکراوەکانی خودا ناتوانێ وتەی کتێبی خودا لە کتێبەکانیدا نەهێڵێو لایبەرێت، بەڵکو دەیگۆڕن، مانایەکی تری بۆ دەکەن جگە لە ماناکەی خۆی. وەهەبی کوڕی مونەببە (مُنَبِّه) وتی: تەوراتو ئینجیل چۆن خودا ناردونیەتە خوار تەنیا پیتێکیان لێ نەگۆڕاوە، بەڵام ئەوان بە تەئویلو دەستکاری کردن گۆڕانکاریان تیدا کردووەو چەندین کتێبیان بە ئارەزووی خۆیان نووسیوە ﴿وَيَقُولُونَ هُوَ مِنْ عِندِ ٱللَّهِ وَمَا هُوَ مِنْ عِندِ ٱللَّهِ﴾ دەڵێن: ئەمە لە لایەن خوداوەیە کەچی خودایش نەیفەرمووە. چونکە کتێبی خودا پارێزراوەو ناگۆڕێ. ئیبنوئەبی حاتەم ڕیوایەتی کردووە. خۆ ئەگەر وەهەبیش مەبەستی ئەو کتێبانەیە کە لەبەر دەستیاندایە گومانی تێدا نیە دەستکاریو گۆڕانکای تیدا کراوەو زیادو کەمیشی هەر لێکراوە، بەڵام بە عەرەبی کردنی ئەو ڕووداوانە دیارە هەڵەی زۆرو زیادو کەمی پتری تێدا کراوە، پڕە لە شتی درۆو گومانأوی خۆیان بەڵکو هەموویان خراپن. بەڵام ئەگەر مەبەستی لەو کتێبانە، ئەوانەبێ کە لە لای خودان، ئەوانە هەموو پارێزراونو هیچیان تێکەڵ نەبووە.

﴿مَا كَانَ لِبَشَرٍ أَن يُؤْتِيَهُ ٱللَّهُ ٱلْكِتَٰبَ وَٱلْحُكْمَ وَٱلنُّبُوَّةَ ثُمَّ يَقُولَ لِلنَّاسِ كُونُوا۟ عِبَادًا لِّى مِن دُونِ ٱللَّهِ وَلَٰكِن كُونُوا۟ رَبَّٰنِيِّۦنَ بِمَا كُنتُمْ تُعَلِّمُونَ ٱلْكِتَٰبَ وَبِمَا كُنتُمْ تَدْرُسُونَ ﴿٧٩﴾ وَلَا يَأْمُرَكُمْ أَن تَتَّخِذُوا۟ ٱلْمَلَٰٓئِكَةَ وَٱلنَّبِيِّۦنَ أَرْبَابًا أَيَأْمُرُكُم بِٱلْكُفْرِ بَعْدَ إِذْ أَنتُم مُّسْلِمُونَ ﴿٨٠﴾﴾

## پێغەمبەر بانگی کەس ناکات بۆ پەرستنی خۆیو پەرستنی ( جگە لە ) خودا

﴿مَا كَانَ لِبَشَرٍ أَن يُؤْتِيَهُ ٱللَّهُ ٱلْكِتَٰبَ وَٱلْحُكْمَ وَٱلنُّبُوَّةَ ثُمَّ يَقُولَ لِلنَّاسِ كُونُوا۟ عِبَادًا لِّى مِن دُونِ ٱللَّهِ﴾ هیچ مرۆڤێك ئەمەی لە خۆی ڕانەبینیوە، کە خودا کتێبی دابێتێو فێری کارزانی کردبێو کردبێتی بە پێغەمبەرو پاشان چووبێو بە خەڵکی ڕاگەیاند بێ کە: ئێوە لە باتی خودا هەر عەبدایەتی من بکەن. ئەمە بۆ پێغەمبەرێکی ڕاسپاردە نەگونجێ، دیارە بۆ خەڵکی تر هەر نابێ، ئەمە زەمو هەڕەشەیە لەو زاناو خواپەرستو پیاوە گەورەو نەفامانەی ئەهلی کتێب. بە پێچەوانەی پێغەمبەرانو

---

[1] إبن أبي حاتم (٣٦١/٢).

شوێنکەوتوانیانەوە لەو زانا ئاکار چاکانە، کە هەڵدەستن بە جێبەجێ کردنی ئەو ئەرکانەی کە خودا فەرمانیان پێدەکاتو پێغەمبەران ئاگاداریان کردوون لێی. ڕێگری دەکەن لەو شتانەی خودا قەدەغەی کردوە، گشت پێغەمبەران (سەلامی خوایان لێ بێ) ڕاسپاردەی خودان لە لایەن خوداوە بۆ لای بەندەکانی بۆ ڕاگەیاندنی ئەو پەیامو ئەمانەتە کە لەسەر شانیانە، ئەوانیش هەڵسان بە گەیاندنیو ئامۆژگاریان کردو ئەو هەقەیان ڕاگەیاند. خودای مەزن دەفەرمووێت: ﴿وَلَٰكِن كُونُوا رَبَّانِيِّينَ بِمَا كُنتُمْ تُعَلِّمُونَ الْكِتَابَ وَبِمَا كُنتُمْ تَدْرُسُونَ﴾ ئەوانە هەر وتوویانە: ئێوەکە فێری کتێبو خوێندنەوە بوون، لەسەرتانە پەروەردگارتان بناسن. واتە: پێغەمبەران دەڵێن بە خەڵکی هەر خودا بناسن. ئیبنوعەبباسو ئەبورەزین کەسانی تریش وتویانە: زاناو لەکارزانو لەسەرخۆ بن.[1] زەححاك وتی: لەم ئایەتەدا: ﴿بِمَا كُنتُمْ تُعَلِّمُونَ الْكِتَابَ وَبِمَا كُنتُمْ تَدْرُسُونَ﴾ ئێوە کە فێری کتێبو خوێندنەوە بوون واتە: کە فێری قورئان خوێندن بوون لەسەرتانە شارەزاش بن تێیداو وتەکانیشی لەبەر بکەن. پاشان خودای مەزن دەفەرمووێت: ﴿وَلَا يَأْمُرَكُمْ أَن تَتَّخِذُوا الْمَلَائِكَةَ وَالنَّبِيِّينَ أَرْبَابًا﴾ فەرمانی بەوە نەداوە کە فریشتەو پێغەمبەران بپەرستن. واتە: فەرمانی پێ نەکردوون کە عیبادەت هیچ شتێ بکەن جگە لە خودا، نە پێغەمبەری ڕاسپاردوە، نە فریشتە نزیکەکان. ﴿أَيَأْمُرُكُم بِالْكُفْرِ بَعْدَ إِذْ أَنتُم مُّسْلِمُونَ﴾ چۆن دەبێ فەرمانتان پێ بدات کە بێ بڕوا بن دوای ئەوەی کە ئێوە بڕوادار بوون؟ واتە: هیچ کەسێ ئەوە ناکات. هەرکەسێ بانگەواز بکات بۆ پەرستنی غەیرەز خودا، ئەوە بانگەواز دەکات بۆ خوانەناسی. پێغەمبەرانیش فەرمانیان کردوە بە بڕواهێنان، کە پەرستنی خودایە بە تەنیاو شەریکی نیە. وەك خودای مەزن دەفەرمووێت: ﴿وَمَا أَرْسَلْنَا مِن قَبْلِكَ مِن رَّسُولٍ إِلَّا نُوحِي إِلَيْهِ أَنَّهُ لَا إِلَٰهَ إِلَّا أَنَا فَاعْبُدُونِ﴾[2] بەر لە تۆیش هەر پێغەمبەرێکمان نارد، ڕامان سپارد کە: هیچ پەرستویەك جگە لە من نیەو هەر تەنیا من بپەرستن. هەروەها دەفەرمووێت: ﴿وَلَقَدْ بَعَثْنَا فِي كُلِّ أُمَّةٍ رَّسُولًا أَنِ اعْبُدُوا اللَّهَ وَاجْتَنِبُوا الطَّاغُوتَ﴾[3] بۆ ناو هەموو کۆمەڵێك پێغەمبەرێکمان بەڕێ کرد، کە خودا بپەرستنو لە شەیتان دوورە پەرێز بن. ﴿وَسْئَلْ مَنْ أَرْسَلْنَا مِن قَبْلِكَ مِن رُّسُلِنَا أَجَعَلْنَا مِن دُونِ الرَّحْمَٰنِ آلِهَةً

---

[1] إبن أبي حاتم (٢/٣٦٥).

[2] الانبياء (٢٥).

[3] النحل (٣٦).

﴿يُعۡبَدُونَ﴾[1] لەو پێغەمبەرانەش بپرسە کە بەر لە تۆ ڕەوانەمان کردون، ئایا ئێمە بڕیارمان داوە (جگە لە خودا) هیچ شتێ تر پەرستوو بێ؟ یان باسی فریشتەکان دەکات‌و دەفەرمووێت: ﴿وَمَن يَقُلۡ مِنۡهُمۡ إِنِّيٓ إِلَٰهٞ مِّن دُونِهِۦ فَذَٰلِكَ نَجۡزِيهِ جَهَنَّمَۚ كَذَٰلِكَ نَجۡزِي ٱلظَّٰلِمِينَ﴾[2] هەرکەسێ لەوان بڵێ: منیش خودایەکم جگە لەو، سزای ئەو کەسە جەهەنمە هەر بەم شێوەیەش خوانەناسان سزا ئەدەین.

﴿وَإِذۡ أَخَذَ ٱللَّهُ مِيثَٰقَ ٱلنَّبِيِّـۧنَ لَمَآ ءَاتَيۡتُكُم مِّن كِتَٰبٖ وَحِكۡمَةٖ ثُمَّ جَآءَكُمۡ رَسُولٞ مُّصَدِّقٞ لِّمَا مَعَكُمۡ لَتُؤۡمِنُنَّ بِهِۦ وَلَتَنصُرُنَّهُۥۚ قَالَ ءَأَقۡرَرۡتُمۡ وَأَخَذۡتُمۡ عَلَىٰ ذَٰلِكُمۡ إِصۡرِيۖ قَالُوٓاْ أَقۡرَرۡنَاۚ قَالَ فَٱشۡهَدُواْ وَأَنَا۠ مَعَكُم مِّنَ ٱلشَّٰهِدِينَ ﴿٨١﴾ فَمَن تَوَلَّىٰ بَعۡدَ ذَٰلِكَ فَأُوْلَٰٓئِكَ هُمُ ٱلۡفَٰسِقُونَ ﴿٨٢﴾﴾

**وەرگرتنی پەیمان لە گشت پێغەمبەران (سەلامی خوایان لێ بێ) کە بڕوا بێنن بە پێغەمبەرمان موحەممەد (ﷺ)**

خودای مەزن باسی ئەوە دەکات کە پەیمانی وەرگرتووە لە هەموو پێغەمبەران کە ڕەوانەی کردوون لە ئادەمەوە (سەلامی خوای لێ بێ) هەتا عیسا (سەلامی خوای لێ بێ) با هەرچەندە کتێب‌و کارزانی پێداون‌و فەرمانی پێداون کە بیگەیەنن، دوای ئەوە کە پێغەمبەرێك هات دەبێ بڕوای پێ بێنن‌و هاوکاری بکەن، ئەو پێغەمبەریەتی‌و زانستە کە خودا پێی داون نابێتە ڕێگر لە شوێن کەوتنی ئەو پێغەمبەرەو یارمەتیدانی. هەر بۆیە خودای گەورە دەفەرمووێت: ﴿وَإِذۡ أَخَذَ ٱللَّهُ مِيثَٰقَ ٱلنَّبِيِّـۧنَ لَمَآ ءَاتَيۡتُكُم مِّن كِتَٰبٖ وَحِكۡمَةٖ ثُمَّ جَآءَكُمۡ رَسُولٞ مُّصَدِّقٞ لِّمَا مَعَكُمۡ لَتُؤۡمِنُنَّ بِهِۦ وَلَتَنصُرُنَّهُۥۚ قَالَ ءَأَقۡرَرۡتُمۡ وَأَخَذۡتُمۡ عَلَىٰ ذَٰلِكُمۡ إِصۡرِي﴾ (بێنەوە بیر) خودا پەیمانی بەست لەگەڵ پێغەمبەرەکانا: ئەوە من کتێب‌و زانست‌و لەکارزانیم بە ئێوە داو پاشان کە پێغەمبەرێك هاتە ناوتان کە ئەوانەی لە لای ئێوەی بەڕاست زانی. دەبێ بڕوای پێ بێنن‌و یارمەتی بدەن. ئەوسا فەرمووی قبوڵتان کرد؟ ئایا ئێوە ئەو ئەرکەم لە ئەستۆ دەگرن؟ ئیبنوعەبباس‌و موجاهیدو ڕەبیع‌و قەتادەو سوودی وتیان: ﴿إِصۡرِي﴾ واتە: پەیمانم.[3] موحەممەدی کوڕی ئیسحاق وتی: ﴿إِصۡرِي﴾ گرانی ئەو پەیمانەی من هەڵدەگرن[4] واتە: ئەو

---

[1] الزخرف (٤٥).

[2] الانبياء (٢٩).

[3] إبن أبي حاتم (٢/٣٧٣-٣٧٤).

[4] إبن أبي حاتم (٢/٢٧٣).

پەیمانە توندو بەهێزەی من دەگرنە ئەستۆ. ﴿قَالُوٓاْ أَقۡرَرۡنَاۚ قَالَ فَٱشۡهَدُواْ وَأَنَا۠ مَعَكُم مِّنَ ٱلشَّٰهِدِينَ﴾ وتیان: بەڵێ: ئەوا گرتمانە ئەستۆی خۆمان. فەرمووی: دەسا بە شایەت بن ئەوا منیش لەگەڵتانم. کەسانێ لەمەوبەدوا لە پەیمان پاشگەز ببنەوە، دیارە لە ڕێ لادەرن. واتە: هەرکەسێ لەم بەڵێنو پەیمانە پەشیمان ببێتەوە دیارە ئەوە لە ڕێ لادەرە. عەلی کوڕی ئەبوتالیبو ئامۆزاکەی عەبدوڵڵای کوڕی عەبباس (ڕەزای خوایان لێ بێ) وتیان: خودا هیچ پێغەمبەرێکی ڕەوانە نەکردوە مەگین پەیمانی لێ وەرگرتوە، ئەگەر موحەممەد (ﷺ) ڕەوانە کرا ئەو پێغەمبەرە زیندوو بوو دەبێ بڕوای پێ بێنێو یارمەتی بدات.[1] فەرمانیشی پێداوە کە بەڵێنیش لە گەلەکەی خۆی وەربگرێت، ئەگەر موحەممەد (ﷺ) ڕەوانە کراو ئەوان زیندوو بوون دەبێ بڕوای پێ بێننو یارمەتیشی بدەن. تاوسو حەسەنی بەسریو قەتادە وتیان: خودا پەیمانی لە پێغەمبەران وەرگرتوە کە دەبێ بڕوایان بە یەکتری ببێت، ئەم قسەیە هیچ دژایەتیەکی نیە لەگەڵ قسەکەی ئیبنوعەبباسدا، چونکە موحەممەد (ﷺ) دوایین پێغەمبەرە بەردەوام هەتا ڕۆژی قیامەت. ئەو پێشەوا مەزنەیە لە هەر چەرخو زەمانێکا پەیدا بوو، دەبێ گوێڕایەڵی بکرێتو لە پێش هەموو پێغەمبەرەکانەوەیە، هەر لەبەر ئەوەیش بووە لە شەوڕەویەکەدا پێش نوێژیان بووە، کاتێ کە لە قودسی پیرۆز کۆبوونەوە. هەر ئەمیش تکا کارە لە ڕۆژی قیامەتدا کاتێ کە خودای مەزن دێت بۆ دادوەری کردنی عەبدەکانیو جیاکردنەوەیان، ئەو شوێنەش (کە تکای تێدا دەکات) شوێنە سوپاس کراوەکەیە (المقام المحمود) کە هەر شایستەی ئەوەو هیچ پێغەمبەرێ ئەو شوێنەی پێ نەدراوەو ئەو شوێنە تایبەتە بە موحەممەدەوە (ﷺ) کە دوایین پێغەمبەرە.

﴿أَفَغَيۡرَ دِينِ ٱللَّهِ يَبۡغُونَ وَلَهُۥٓ أَسۡلَمَ مَن فِي ٱلسَّمَٰوَٰتِ وَٱلۡأَرۡضِ طَوۡعٗا وَكَرۡهٗا وَإِلَيۡهِ يُرۡجَعُونَ ﴿٨٣﴾ قُلۡ ءَامَنَّا بِٱللَّهِ وَمَآ أُنزِلَ عَلَيۡنَا وَمَآ أُنزِلَ عَلَىٰٓ إِبۡرَٰهِيمَ وَإِسۡمَٰعِيلَ وَإِسۡحَٰقَ وَيَعۡقُوبَ وَٱلۡأَسۡبَاطِ وَمَآ أُوتِيَ مُوسَىٰ وَعِيسَىٰ وَٱلنَّبِيُّونَ مِن رَّبِّهِمۡ لَا نُفَرِّقُ بَيۡنَ أَحَدٖ مِّنۡهُمۡ وَنَحۡنُ لَهُۥ مُسۡلِمُونَ ﴿٨٤﴾ وَمَن يَبۡتَغِ غَيۡرَ ٱلۡإِسۡلَٰمِ دِينٗا فَلَن يُقۡبَلَ مِنۡهُ وَهُوَ فِي ٱلۡأٓخِرَةِ مِنَ ٱلۡخَٰسِرِينَ ﴿٨٥﴾﴾

### ئاین هەر ئاینی ئیسلامە جگە لەم قبوڵ ناکرێ لە هیچ کەس

خودای مەزن بێزاری خۆی دەردەبڕێ لەو کەسەی ئاینێکی تری دەوێ جگە لە ئاینی خۆی، کە بە کتێبەکانیا ناردویەتیو پێغەمبەرانی ڕەوانە کردووە پێی کە پەرستنی خودایە بە تەنیاو شەریکی نیە ﴿أَفَغَيۡرَ دِينِ ٱللَّهِ يَبۡغُونَ وَلَهُۥٓ أَسۡلَمَ مَن فِي ٱلسَّمَٰوَٰتِ وَٱلۡأَرۡضِ﴾ ئایا ئاینێ جگە لە ئاینی خودایان دەوێ؟ کە هەرچی لە ئاسمانەکانو زەویدایە ملکەچی ئەون. ﴿طَوۡعٗا وَكَرۡهٗا﴾ بیانەوێ یا

[1] الطبري (٦/٥٥٥).

نەیانەوێ (چارو ناچار) وەك خودای گەورە لە ئایەتێکی تریشدا دەفەرموێت: ﴿وَلِلَّهِ يَسْجُدُ مَن فِي السَّمَاوَاتِ وَالْأَرْضِ طَوْعًا وَكَرْهًا﴾[1] هەرچیەك هەیە لە نێوان ئەم ئاسمانانو زەمینە بیانەوێ یان نەیانەوێ (چارو ناچار) گشتیان سوژدە بۆ خوا دەبەن. هەروەها دەفەرموێت: ﴿أَوَلَمْ يَرَوْا إِلَىٰ مَا خَلَقَ اللَّهُ مِن شَيْءٍ يَتَفَيَّأُ ظِلَالُهُ عَنِ الْيَمِينِ وَالشَّمَائِلِ سُجَّدًا لِّلَّهِ وَهُمْ دَاخِرُونَ ﴿٤٨﴾ وَلِلَّهِ يَسْجُدُ مَا فِي السَّمَاوَاتِ وَمَا فِي الْأَرْضِ مِن دَابَّةٍ وَالْمَلَائِكَةُ وَهُمْ لَا يَسْتَكْبِرُونَ ﴿٤٩﴾ يَخَافُونَ رَبَّهُم مِّن فَوْقِهِمْ وَيَفْعَلُونَ مَا يُؤْمَرُونَ﴾[2] ئایا بە چاو نەیاندیوە. هەرچی خودا وەدی هێناوە، سێبەریان (بە ڕاستو چەپا) بە ملکەچی سوژدە بەرەو خوا دەبەن؟ هەرچی لەناو ئاسمانانو هەرچی لەناو زەمیندایە دەجولێو فریشتەکانیش سوژدە بۆ خوا دەبەنو لە خۆبایی نین. ترسیان هەیە لە پەروەردگاری بان سەریان، هەر فەرمانێکیان بەسەریدا بەجێی دێنن. خاوەن باوەڕ بە دڵو بە گیان خۆی تەسلیمی خودا دەکات بەڵام خوانەناس بە ناچاری، چونکە لە ژێر دەسەڵاتو توانای بەهێزو مەزنی خوادایە کە هیچ کەس ناتوانێ ملی بۆ کەچ نەکاتو سەری بۆ نەوی نەکات. وەکیع لە تەفسیرەکەیدا ڕیوایەتی کردوە لە موجاهیدەوە ﴿وَلَهُ أَسْلَمَ مَن فِي السَّمَاوَاتِ وَالْأَرْضِ طَوْعًا وَكَرْهًا﴾ هەرچی لە ئاسمانانو زەمیندایە (چارو نەچار) ملکەچی فەرمانی ئەون. وتی: ئەم ئایەتە وەك ئەو ئایەتە وایە کە خودای مەزن دەفەرموێت: ﴿وَلَئِن سَأَلْتَهُم مَّنْ خَلَقَ السَّمَاوَاتِ وَالْأَرْضَ لَيَقُولُنَّ اللَّهُ﴾[3]،[4] ئەگەر لەوانە بپرسی، کێ ئاسمانەکانو زەمینی وەدی هێنا؟ دەڵێن: خودا. ئیبنوعەبباسیش ڕیوایەتی کردوە ﴿وَلَهُ أَسْلَمَ مَن فِي السَّمَاوَاتِ وَالْأَرْضِ طَوْعًا وَكَرْهًا﴾ هەرچی لە ئاسمانەکانو زەمیندایە (بیانەوێو نەیانەوێ) ملکەچی فەرمانی خودان. وتی: لەکاتی وەرگرتنی پەیماندا.[5] ﴿وَإِلَيْهِ يُرْجَعُونَ﴾ دەشگەڕێنەوە بۆ لای ئەو، لە ڕۆژی قیامەتدا هەرکەسەو بەپێی کرداری خۆی پاداشتی وەردەگرێ. پاشان خودای مەزن دەفەرموێت: ﴿قُلْ آمَنَّا بِاللَّهِ وَمَا أُنزِلَ عَلَيْنَا وَمَا أُنزِلَ عَلَىٰ إِبْرَاهِيمَ وَإِسْمَاعِيلَ وَإِسْحَاقَ وَيَعْقُوبَ وَالْأَسْبَاطِ﴾ بڵێ:

---

[1] الرعد (١٥).

[2] النحل (٤٨–٥٠).

[3] لقمان (٢٥).

[4] الطبري (٦/٥٦٥).

[5] الطبري (٦/٥٦٥).

باوەڕمان هێناوە بە خواو لەوەیش لە ئەوەوە بۆمان هاتووەو بەو شتانەش کە لە لایەن پەروەردگارەوە بۆ ئیبراهیمو ئیسماعیلو ئیسحاقو یەعقووب هاتبوو. واتە: بڕوامان هێناوە بە قورئانو ئەو کتێبو نامانەیش کە بۆ پێغەمبەران هاتووە. ﴿وَٱلۡأَسۡبَاطِ﴾ ئەوانەن کە لە ڕەچەڵەکی یەعقوبن لە دوانزە کوڕەکەی. ﴿وَمَآ أُوتِيَ مُوسَىٰ وَعِيسَىٰ وَٱلنَّبِيُّونَ مِن رَّبِّهِمۡ لَا نُفَرِّقُ بَيۡنَ أَحَدٖ مِّنۡهُمۡ وَنَحۡنُ لَهُۥ مُسۡلِمُونَ﴾ بەو شتانەش (تەوراتو ئینجیل) کە بۆ مووساو عیساو ئەوەشی کە بۆ پێغەمبەرانی تر هاتووە ئێمە بەرانبەر بە کەسیان هیچ جیاوازی ناکەینو خۆمان بە خودا دەسپێرین. خاوەن باوەڕانی ئەم ئوممەتە بڕوایان بە گشت پێغەمبەرێ هەیە کە ڕەوانە کراوە. بە هەموو کتێبێکیش کە بۆ ئەوان هاتووە، حاشا لە هیچی ناکەن، بەڵکو ئەوەی لە لایەن خوداوە هاتووە بڕوایان پێی هەیەو بە هەر پێغەمبەرێ ئەو ناردویەتی. پاشان خودای گەورە دەفەرموویێت: ﴿وَمَن يَبۡتَغِ غَيۡرَ ٱلۡإِسۡلَٰمِ دِينٗا فَلَن يُقۡبَلَ مِنۡهُ وَهُوَ فِي ٱلۡأٓخِرَةِ مِنَ ٱلۡخَٰسِرِينَ﴾ هەرکەسێ جگە لە ئیسلام، هەر ئاینێکی تری هەبێ، لێی وەرناگیرێ، لە دواڕۆژیشدا لە ڕیزی زیانبارانە. واتە: هەرکەسێ هەر ڕێگایەك بگرێتە بەر جگە لە ڕێگاو بەرنامەی خودا، لێی قبووڵ ناکرێو لە ڕۆژی قیامەتدا لە کۆمەڵی زیانبارانە. وەك پێغەمبەری خودا (ﷺ) فەرموویەتی: (هەرکەسێ کارێکی کردبێ، فەرمانی ئێمەی لەسەر نەبوبێ، ئەو کارە وەرنەگیراوە)[1] ئیمامی ئەحمەد لە حەسەنەوە ڕیوایەتی کردوە: ئەبوهورەیرە بۆی گێڕاینەوە لەو کاتەدا ئێمە لە مەدینە بووین وتی: پێغەمبەری خودا (ﷺ) فەرموویەتی: (کردار لە ڕۆژی قیامەتدا دەهێنرێن، نوێژ دەهێنرێو دەڵێ: ئەی پەروەردگار، من نوێژم. پێی دەفەرموێت: بێگومان تۆ لەسەر فەرڕ پیتی. سەدەقە دەهێنرێ دەڵێ: ئەی پەروەردگار، من سەدەقەم. دەفەرموویێت:بێگومان تۆ لەسەر فەرڕ پیتی. پاشان ڕۆژوو دەهێنرێو دەڵێ: من ڕۆژووم، دەفەرموویێت: بێگومان تۆ لەسەر فەرڕ پیتی. پاشان کردارەکان دەهێنرێن، بۆ هەموو ئەوانەیش خودای مەزن دەفەرموویێت: بێگومان تۆ لەسەر فەرڕ پیتی. پاشا ئیسلام دەهێنرێو دەڵێ: ئەی پەروەردگار تۆ سەلامیو منیش ئیسلامم، خودای مەزن دەفەرموویێت: بێگومان تۆ لەسەر فەرڕ پیتی ئەمڕۆ بەهۆی تۆوە دەگیرێو بەهۆی تۆشەوە دەبەخشرێ. خودای مەزن لە کتێبەکەیدا کە (قورئانە) دەفەرموویێت: ﴿وَمَن يَبۡتَغِ غَيۡرَ ٱلۡإِسۡلَٰمِ دِينٗا فَلَن يُقۡبَلَ مِنۡهُ وَهُوَ فِي ٱلۡأٓخِرَةِ مِنَ ٱلۡخَٰسِرِينَ﴾ هەرکەسێ جگە لە ئیسلام، هەر ئاینێکی تری هەبێ. لێی وەرناگیرێ لە ڕۆژی قیامەتدا لە ڕیزی زیانبارانە. تەنیا ئەحمەد خۆی ئەم فەرموودەی هێناوە[2].

---

[1] فتح الباري (٥/٣٥٥).

[2] أحمد (٢/٣٦٢)، فەرموودەیەکی لاوازە.

﴿كَيْفَ يَهْدِي ٱللَّهُ قَوْمًا كَفَرُوا۟ بَعْدَ إِيمَٰنِهِمْ وَشَهِدُوٓا۟ أَنَّ ٱلرَّسُولَ حَقٌّ وَجَآءَهُمُ ٱلْبَيِّنَٰتُ ۚ وَٱللَّهُ لَا يَهْدِي ٱلْقَوْمَ ٱلظَّٰلِمِينَ ﴿٨٦﴾ أُو۟لَٰٓئِكَ جَزَآؤُهُمْ أَنَّ عَلَيْهِمْ لَعْنَةَ ٱللَّهِ وَٱلْمَلَٰٓئِكَةِ وَٱلنَّاسِ أَجْمَعِينَ ﴿٨٧﴾ خَٰلِدِينَ فِيهَا لَا يُخَفَّفُ عَنْهُمُ ٱلْعَذَابُ وَلَا هُمْ يُنظَرُونَ ﴿٨٨﴾ إِلَّا ٱلَّذِينَ تَابُوا۟ مِنۢ بَعْدِ ذَٰلِكَ وَأَصْلَحُوا۟ فَإِنَّ ٱللَّهَ غَفُورٌ رَّحِيمٌ ﴿٨٩﴾﴾

**خودا كۆمەڵێ شارەزا ناكات دوای بڕواهێنان بووبێتەوە خوانەناس مەگین تەوبەی كردبێ**

ئیبنوجەریر ڕیوایەتی كردوە لە ئیبنوعەبباسەوە، وتی: پیاوێ هات لە ئەنساریەكان موسوڵمان بوو پاشان پەشیمان بوەوەو ڕۆشتەوە بۆ ناو بت پەرستەكان، پاشان پەشیمانی خۆی دەربڕی ناردی بۆ لای كەس‌و كاری كە پرسیارم بۆ بكەن ئایا من تەوبەكردنم بۆ هەیە؟ وتی: ئەم ئایەتە هاتە خوارەوە كە خودای مەزن دەفەرموێت: ﴿كَيْفَ يَهْدِي ٱللَّهُ قَوْمًا كَفَرُوا۟ بَعْدَ إِيمَٰنِهِمْ﴾ هەتا دەگاتە ﴿فَإِنَّ ٱللَّهَ غَفُورٌ رَّحِيمٌ﴾ كەس‌و كارەكەی ناردیان بەدوایداو موسوڵمان بوەوە.[1] هەر بەم شێوەیە نەسائی‌و حاكیم‌و إبن حبان ڕیوایەتیان كردوە[2] حاكیم وتی: سەنەدەكانی سەحیحە. خودای گەورە دەفەرموێت: ﴿كَيْفَ يَهْدِي ٱللَّهُ قَوْمًا كَفَرُوا۟ بَعْدَ إِيمَٰنِهِمْ وَشَهِدُوٓا۟ أَنَّ ٱلرَّسُولَ حَقٌّ وَجَآءَهُمُ ٱلْبَيِّنَٰتُ﴾ جا چۆن خودا ئەوانە دەخاتە سەر ڕاستە ڕێگە كە پاش باوەڕهێنان‌و شایەتی دان كە (ئەم پێغەمبەرە ڕاستە)و چەندین نیشانەشیان بۆ هاتووە. واتە: بەڵگەو نیشانەی تەواویان بۆ هاتووە لەسەر ڕاستی ئەو پەیامەی كە بۆی هێناون‌و هەموو شتێكی بۆ ڕوون كردونەتەوە، پاشان پەشیمان دەبنەوەو دەچنەوە سەر بت پەرستی‌و خوانەناسی، ئەوانە چۆن شایستەی ڕێنیشاندانن كە چوونەتەوە سەر گومڕایی‌و بێ دینی. هەر بۆیە خودای مەزن دەفەرموێت: ﴿وَٱللَّهُ لَا يَهْدِي ٱلْقَوْمَ ٱلظَّٰلِمِينَ﴾ خودا هەرگیز ناهەقیكاران ڕزگار ناكات‌و شارەزایان ناكات. پاشان خودای مەزن دەفەرموێت: ﴿أُو۟لَٰٓئِكَ جَزَآؤُهُمْ أَنَّ عَلَيْهِمْ لَعْنَةَ ٱللَّهِ وَٱلْمَلَٰٓئِكَةِ وَٱلنَّاسِ أَجْمَعِينَ﴾ جەزای ئەوانە نەفرینە لە خوداوەو لە فریشتەكانی‌و لە هەموو خەڵكی دنیاوە. ﴿خَٰلِدِينَ فِيهَا لَا يُخَفَّفُ عَنْهُمُ ٱلْعَذَابُ وَلَا هُمْ يُنظَرُونَ﴾ هەتا هەتایە لەم نەفرینەدا دەمێننەوەو ئازاریان لەسەر سووك نابێ‌و ماوە پێدانیشیان نیە. واتە: هیچ مۆڵەت نادرێن‌و سزایان لەسەر سووك ناكرێ تەنیا ساتێكیش. پاشان خودای گەورە دەفەرموێت: ﴿إِلَّا ٱلَّذِينَ تَابُوا۟ مِنۢ

---

[1] الطبري (٦/٥٧٢).

[2] النسائي في الكبرى (٦/٣١١)، الحاكم (٤/٣٦٦)، إبن حبان (٦/٣٢٣)، حاكم‌و زەهەبی بە سەحیحیان داناوە.

بَعۡدِ ذَٰلِكَ وَأَصۡلَحُواْ فَإِنَّ ٱللَّهَ غَفُورٞ رَّحِيمٌ﴾ مەگین ئەوانەی لە دواجار (بۆ خۆیان) پەشیمان دەبنەوەو ئاکاری چاك ڕەچاو دەکەن، ئەوسا خودا لێبوردەو دلۆڤانە. ئەمەیش لە سۆزو بەزەییو دلۆڤانی خودا خۆیەوەیە کە هەرکەسێ پەشیمان بووەوەو تەوبەی کرد، لێی خۆش دەبێ.

﴿إِنَّ ٱلَّذِينَ كَفَرُواْ بَعۡدَ إِيمَٰنِهِمۡ ثُمَّ ٱزۡدَادُواْ كُفۡرٗا لَّن تُقۡبَلَ تَوۡبَتُهُمۡ وَأُوْلَٰٓئِكَ هُمُ ٱلضَّآلُّونَ ﴿٩٠﴾ إِنَّ ٱلَّذِينَ كَفَرُواْ وَمَاتُواْ وَهُمۡ كُفَّارٞ فَلَن يُقۡبَلَ مِنۡ أَحَدِهِم مِّلۡءُ ٱلۡأَرۡضِ ذَهَبٗا وَلَوِ ٱفۡتَدَىٰ بِهِۦٓۗ أُوْلَٰٓئِكَ لَهُمۡ عَذَابٌ أَلِيمٞ وَمَا لَهُم مِّن نَّٰصِرِينَ ﴿٩١﴾﴾

## لە کاتی مردندا پەشیمانی خوانەناسی قبوولْ ناکرێو لە ڕۆژی قیامەتدا فیدیەشی لێ وەرناگیرێ

خودای مەزن زۆر بە توندی هەڕەشە دەکات لەو کەسانە لە دوای بڕواهێنان پەشیمان دەبنەوەو بەردەوام لەسەر بێ دینی دەمێننەوە هەتا دەمرن. لەکاتی مردنیاندا تەوبەیان لێ وەرناگیرێ وەك دەفەرمووێت: ﴿وَلَيۡسَتِ ٱلتَّوۡبَةُ لِلَّذِينَ يَعۡمَلُونَ ٱلسَّيِّـَٔاتِ حَتَّىٰٓ إِذَا حَضَرَ أَحَدَهُمُ ٱلۡمَوۡتُ قَالَ إِنِّي تُبۡتُ ٱلۡـَٰٔنَ﴾[1] ئیتر پەشیمان بوونەوەی ئەوانە هیچ بەهرەی نیە بۆ ئەوانەی تاوانی زۆر دەکەن لە کاتی گیانەلاودا دەڵێن ئێمە پەشیمانین وە لێرەیشا دەفەرمووێت: ﴿إِنَّ ٱلَّذِينَ كَفَرُواْ بَعۡدَ إِيمَٰنِهِمۡ ثُمَّ ٱزۡدَادُواْ كُفۡرٗا لَّن تُقۡبَلَ تَوۡبَتُهُمۡ وَأُوْلَٰٓئِكَ هُمُ ٱلضَّآلُّونَ﴾ ئەو کەسانەی دوای بڕواهێنان وەرگەڕان، هەر لەسەر بێ ئەو باوەڕیە چوون، پەشیمانی تازە سوودیان پێ ناگەیەنێو چوونەتە ناو گومڕاییەوە. واتە: دەرچوون لە پەیڕەوی هەقو بەرەو گومڕایی ڕۆشتوون. حافیز ئەبوبەکری بەزار وتی لە ئیبنوعەبباسەوە کە کۆمەڵێ موسوڵمان بوونو پاشان پاشگەز بوونەوە. دوای ئەوە موسوڵمان بوونەوە. دیسان پەشیمان بوونەوە. ناردیان بۆ لای هۆزەکەیان پرسیاریان بۆ بکەن، ئەوەیان بۆ پێغەمبەر باس کرد، ئەم ئایەتە هاتە خوارەوە: ﴿إِنَّ ٱلَّذِينَ كَفَرُواْ بَعۡدَ إِيمَٰنِهِمۡ ثُمَّ ٱزۡدَادُواْ كُفۡرٗا لَّن تُقۡبَلَ تَوۡبَتُهُمۡ﴾ ئەو کەسانەی دوای بڕواهێنان وەرگەڕانو هەر لەسەر ئەو بێ باوەڕیە چوون، پەشیمانی تازە بەهرەیان پێ ناگەیەنێ[2]. پاشان خودای گەورە دەفەرمووێت: ﴿إِنَّ ٱلَّذِينَ كَفَرُواْ وَمَاتُواْ وَهُمۡ كُفَّارٞ فَلَن يُقۡبَلَ مِنۡ أَحَدِهِم مِّلۡءُ ٱلۡأَرۡضِ ذَهَبٗا وَلَوِ ٱفۡتَدَىٰ بِهِۦٓ﴾ ئەوانەی خوانەناس بوونو هەر بە خوانەناسی مردوون. ئەگەر پڕی ئەم زەمینە زێڕیش بە بارمتە بدات، هەرگیز بەهرەیان پێ

---

[1] النساء (١٨).

[2] الدر المنثور (٢/٢٥٨). سەنەدەکەی چاکە.

ناگەیەنێ. واتە: هەرکەسێ بە خوانەناسی مرد هەرگیز چاکەی لێ وەرناگیرێ، با بە ئەندازەی پڕی زەویش خێری کردبێت هیچ سودێکی پێ ناگەیەنێت. وەك پرسیار لە پێغەمبەر (ﷺ) دەربارەی عەبدوڵڵای کوڕی جدعان کە زۆر میوان پەروەرو دیلو بێ نەوای ئازاد دەکردو یارمەتی ئەدانو خواردنی زۆر ئەدا بە خەڵکی ئاخۆ ئەوە سوودی هەیە بۆی؟ فەرمووی: (نەخێر، ئەو ڕۆژێ لە ڕۆژان نەیووتوە: ئەی پەروەردگارم لە تاوانەکانم خۆش ببە لە ڕۆژی قیامەتدا).[1] هەر بەو جۆرە ئەو کەسەی پڕی زەمین ئاڵتون لە بارمتەدا بدا لێی قبووڵ ناکرێ. وەك خودای مەزن دەفەرموێت: ﴿وَلَا يُقْبَلُ مِنْهَا عَدْلٌ وَلَا تَنفَعُهَا شَفَٰعَةٌ﴾[2] بارمتەی لەو ڕۆژەدا لێ وەرناگیرێو تکاکاریش بەهرە نادات. ﴿لَّا بَيْعٌ فِيهِ وَلَا خِلَٰلٌ﴾[3] نە کڕینو نە فرۆشتن هەیەو نە دۆستایەتیو هاوەڵی. ﴿إِنَّ ٱلَّذِينَ كَفَرُواْ لَوْ أَنَّ لَهُم مَّا فِى ٱلْأَرْضِ جَمِيعًا وَمِثْلَهُۥ مَعَهُۥ لِيَفْتَدُواْ بِهِۦ مِنْ عَذَابِ يَوْمِ ٱلْقِيَٰمَةِ مَا تُقُبِّلَ مِنْهُمْ ۖ وَلَهُمْ عَذَابٌ أَلِيمٌ﴾[4] ئەو کەسانەی خوانەناس بوون، ئەگەر هەرچی لە زەمیندا هەیەو ئەوەندەی تریشی لەگەڵ بێ، بە هیوا بن لە سزای ڕۆژی قیامەت ڕزگاریان بکاتو خۆیانی پێ بکڕنەوە، جێگە ناگرێو بە هیچ ناچێو ئازاری زۆر بە ژانیان هەر تووش دەبێ. ئەم ئایەتە ڕوونی دەکاتەوە کە هیچ شتێ خوانەناس ڕزگار ناکات لە سزای خودا، با بە پڕی زەمینیش ئاڵتون لە بارمتەدا بدات بە کەژو کێوو خۆڵو تەپۆڵکەو دەشتو لمو وشکاییو دەریاکانیشەوە. ئیمامی ئەحمەد لە ئەنەسەوە ڕیوایەتی کردوە : پێغەمبەری خودا (ﷺ) فەرموویەتی: (پیاوێ دەهێنرێ لە خەڵکی بەهەشت پێی دەفەرموێت: ئەی نەوەی ئادەم شوێنەکەی خۆت چۆن بینیوە؟ دەڵێ: ئەی پەروەردگارم چاکترین شوێنە، دەفەرموێت: دەداواکەو ئاوات بخوازە. دەڵێ: نەداوا دەکەمو نە ئاواتیش دەخوازم ئەوە نەبێ کە بمگێڕیتەوە بۆ دنیا کە لە ڕێی تۆدا دە جار بکوژرێم، کاتێ کە ڕێزی شەهیدی دەبینێ. پیاوێ دەهێنرێ لە خەڵکی ئاگر پێی دەفەرموێت: ئەی نەوەی ئادەم شوێنەکەی خۆت چۆن بینی؟ دەڵێ: ئەی پەروەردگارم خراپترین شوێنە. پێی دەفەرموێ: بە پڕی زەمین بارمتەم پێ ئەدەی؟ دەڵی: بەڵێ ئەی پەروەردگارم (خودای مەزن) دەفەرموێت: درۆت کرد، من کەمترو ئاسانترم لەوە لێ داوا کردی، تۆ نەت کرد، دەبرێتەوە بۆ ناو

---

[1] مسلم (١/١٩٦).

[2] البقرة (١٢٣).

[3] ابراهیم (٣١).

[4] المائدة (٣٦).

ناگن).[1] هەر بۆیە خودای مەزن دەفەرمووێت: ﴿أُوْلَٰٓئِكَ لَهُمۡ عَذَابٌ أَلِيمٌ وَمَا لَهُم مِّن نَّٰصِرِينَ﴾ ئەوانە ئازاری بە ژانیان دەبێتو کەسیش بە هانایانەوە نایەت. واتە: هیچ کەسێ ناتوانێ ڕزگاریان بکات لەوسزایەی خودایەو لایان نادات لەو سزابەژانە.

﴿لَن تَنَالُواْ ٱلۡبِرَّ حَتَّىٰ تُنفِقُواْ مِمَّا تُحِبُّونَۚ وَمَا تُنفِقُواْ مِن شَيۡءٖ فَإِنَّ ٱللَّهَ بِهِۦ عَلِيمٞ ﴿٩٢﴾﴾

**بەخشینی خۆشەویستترینماڵو سامان لە چاکەکردن**

﴿لَن تَنَالُواْ ٱلۡبِرَّ حَتَّىٰ تُنفِقُواْ مِمَّا تُحِبُّونَۚ وَمَا تُنفِقُواْ مِن شَيۡءٖ فَإِنَّ ٱللَّهَ بِهِۦ عَلِيمٞ﴾ تا ئەو شتەی کە ئێوە خۆشتان دەوێ، نەبەخشن لە ڕێی خودادا، هەرگیز خێرتان پێ ناگات. هەر شتێکیش بکەن بە خێر لە ڕێی خودا، خودا دەیزانێ. وەکیع لە تەفسیرەکەیدا ڕیوایەتی کردوە لە عەمری کوڕی مەیمونەوە ﴿لَن تَنَالُواْ ٱلۡبِرَّ﴾ وتی: مەبەست پێی بەهەشتە.[2] ئیمامی ئەحمەد ڕیواتی کردوە لە ئەنەسی کوڕی مالیکەوە، دەڵێت: ئەبوتەلحە لە زۆرترین ساماندارەکانی ئەنساریەکانی مەدینە بوو. خۆشەویسترین ماڵی لە لای بەیروحاء (بَیرُحاء) بوو، کە ڕووبەڕووی مزگەوت بوو. پێغەمبەر (ﷺ) دەچووە ناویو لە ئاوەکەی دەخواردەوە، ئاوەکەی خۆشو سازگار بوو. ئەنەس وتی: کاتێ کە ئەم ئایەتە هاتە خوار ﴿لَن تَنَالُواْ ٱلۡبِرَّ حَتَّىٰ تُنفِقُواْ مِمَّا تُحِبُّونَ﴾ ئێوە هەرگیز بە خێرو چاکە ناگەن، خودای مەزن هەندێ لەو دارایی یەی خۆشتان دەوێ نەبەخشن، ئەبوتەلحە وتی: خودای مەزن دەفەرمووێت: ﴿لَن تَنَالُواْ ٱلۡبِرَّ حَتَّىٰ تُنفِقُواْ مِمَّا تُحِبُّونَ﴾ بێگومان خۆشەویسترین ماڵ لە لای من بەیروحائە، ئەوا ئەیبەخشم بە خودای گەورە: بە هیوای ئەوەی چاکەو پاداشتم لای خودای مەزن بۆ تۆمار بکرێت. جا تۆ ئەی پێغەمبەری خودا (ﷺ) چی لێ دەکەی ئارەزوی خۆتە. پێغەمبەر فەرمووی: (بەخ بەخ بەڕاستی سامانێکی بە قازانجە، سامانێکی بەسوودە. گوێم لێبوو دەربارەی باخەکە چیت وت: من پێم باشە دابەشی بکەی بەسەر خزمەکانتا) ئەویش دابەشی کرد بەسەر خزمو ئامۆزاکانیا.[3] لە هەردوو سەحیحەکەیشا هاتووە[4] لە هەردوو سەحیحەکەشدا هاتووە لە عومەرەوە (ڕەزای خوای لێ بێ) وتی: ئەی پێغەمبەری خودا (ﷺ) هیچ ماڵێکم هەرگیز بەرنەکەوتووە بەنرختر بێ لەو بەشەی خەیبەر (کە بەرم کەوتوە)، تۆ چی

---

[1] أحمد (٣/٢٠٧)، سەحیحە.

[2] الطبري (٦/٥٨٧).

[3] أحمد (٣/١٤١)، سەحیحە.

[4] فتح الباري (٨/٧١)، مسلم (٢/٦٦٣).

فەرمانێکم پێ دەکەی لەو بارەیەوە؟ فەرمووی: (ئەسڵەکەی بهێڵەوە (وقف بکەو) بەرهەمەکەی بکە بەخێر).

﴿كُلُّ ٱلطَّعَامِ كَانَ حِلًّا لِّبَنِىٓ إِسْرَٰٓءِيلَ إِلَّا مَا حَرَّمَ إِسْرَٰٓءِيلُ عَلَىٰ نَفْسِهِۦ مِن قَبْلِ أَن تُنَزَّلَ ٱلتَّوْرَىٰةُ ۗ قُلْ فَأْتُوا۟ بِٱلتَّوْرَىٰةِ فَٱتْلُوهَآ إِن كُنتُمْ صَٰدِقِينَ ﴿٩٣﴾ فَمَنِ ٱفْتَرَىٰ عَلَى ٱللَّهِ ٱلْكَذِبَ مِنۢ بَعْدِ ذَٰلِكَ فَأُو۟لَٰٓئِكَ هُمُ ٱلظَّٰلِمُونَ ﴿٩٤﴾ قُلْ صَدَقَ ٱللَّهُ ۗ فَٱتَّبِعُوا۟ مِلَّةَ إِبْرَٰهِيمَ حَنِيفًا وَمَا كَانَ مِنَ ٱلْمُشْرِكِينَ ﴿٩٥﴾﴾

## پرسیارەکانی جوولەکە لە پێغەمبەرمان موحەممەد (ﷺ)

خـــودای گـــەورە ئەفـــەرموێت: ﴿كُلُّ ٱلطَّعَامِ كَانَ حِلًّا لِّبَنِىٓ إِسْرَٰٓءِيلَ إِلَّا مَا حَرَّمَ إِسْرَٰٓءِيلُ عَلَىٰ نَفْسِهِۦ﴾ هەموو جۆرە خواردەمەنیە بۆ نەوەی ئیسرائیل ڕەوا کرابوو، مەگین ئەوەی ئیسرائیل خۆی پارێزی لێکردووە. ئیمامی ئەحمەد ڕیوایەتی کردووە لە ئیبنوعەبباسەوە وتی: کۆمەڵێ لە جوولەکەکان هاتنە خزمەت پێغەمبەری خودا (ﷺ) وتیان: دەربارەی ئەو پرسیارانەی کەلێت دەکەین قسەمان بۆبکە کە هیچ کەسێ نایانزانێ جگەلە پێغەمبەر، فەرمووی: (هەر پرسیارێکتان دەوێ بیکەن، بەڵام خودا بکەنە شایەت کە ئەوەی یەعقوب وەری گرتووە لە نەوەکانی، ئەگەر من شتێکم بۆ باس کردن ئێوەیش دەتانزانی لەسەر ئیسلام پەیڕەویم بکەن) وتیان: ئەو بەڵێنەت پێ ئەدەین. فەرمووی: (هەر پرسیارێکتان دەوێ بیکەن) وتیان: باسی چوار شتمان بۆ بکە: چ جۆرە خواردنێ یەعقوب حەرامی کرد لە خۆی؟ ئاوی پیاوو ئاوی ژن چۆنە؟ چۆن نێرو مێی لێ پەیدا دەبێ؟ وە هەواڵمان بدەرێ ئەم پێغەمبەرە نەخوێندەوارە لە خەوتنا چۆنەو کێ لە فریشتەکان پشتگیرو دۆستیەتی؟ بەڵێنی لێ وەرگرتن ئەگەر هەواڵی دانێ شوێنی بکەوی. فەرمووی: (سوێندتان ئەدەم بەو کەسەی کە تەوراتی ناردوە بۆ مووسا، ئایا دەزانن کە یەعقوب نەخۆشیەکی زۆر گرانی تووش هاتو نەخۆشیەکەی درێژەی کێشا، بڕیاری داو خوای کردە شایەت بەسەر خۆیەوە، ئەگەر خودا لەو نەخۆشیەی چاکی کردەوە خۆشەویسترین خواردنەوەو خۆشەویسترین خواردن لە خۆی حەرام بکات. خۆشەویسترین خواردن لەلای گۆشتی وشتر بوو خۆشەویسترین خواردنەوەش شیرەکەیان بوو) وتیان: ئەی خودایە بەڵێ، فەرمووی: (ئەی خودایە تۆ شایەت بە بەسەریانەوە) فەرمووی: (سوێندتان ئەدەم بەو کەسەی کە هیچ پەرستراوێ نیە بێجگە لەو کە تەوراتی ناردۆتە خوارەوە بۆ مووسا ئایا دەزانن ئاوی پیاو سپی و ئەستوورەو ئاوی ژن زەردو تەنکە هەرکامیان بەرز بوە بەسەر ئەوی تردا ئەو منداڵی ئەوەو لەویش دەچێ بە ئیزنی خودا، ئەگەر ئاوی پیاوەکە بەرز بوە بەسەر ئاوی ژنەکەدا ئەو منداڵە نێرینە دەبێ بە ئیزنی خودا، ئەگەر ئاوی ژنەکە سەرکەوت بەسەر ئاوی پیاوەکەدا ئەو منداڵە مێینە دەبێ بە ئیزنی خودا). وتیان: بەڵێ، فەرمووی: (ئەی خودایە تۆ شایەت بە بەسەریانەوە) فەرمووی: (سوێندتان

ئەدەم بەو کەسەی کە تەوراتی ناردوە بۆ سەر مووسا، ئایا دەزانن ئەم پێغەمبەرە نەخوێندەوارە هەردوو چاوی دەخەوێ بەڵام دڵی ناخەوێ)؟ وتیان: بەڵێ. فەرمووی: (ئەی خودایە تۆ شایەت بە) وتیان: تۆ ئێستا باسی دۆستەکەت کرد لەناو فریشتەکاندا؟ ئا لێرەدا یان لەگەڵت دەبین یان لێت جیادەبینەوە. فەرمووی: (بێگومان دۆستی من جوبرەئیلە خودا هەرگیز هیچ پێغەمبەرێکی نەناردوە مەگین ئەو یارمەتی دەری بووە) وتیان: سا لێرەدا لێت جیا دەبینەوە، ئەگەر یارمەتی دەرەکەی تۆ هەر کەسێکی تر بوایە شوێنت دەکەوتین. ئا لەو کاتەدا خودای گەورە فەرمووی: ﴿قُلْ مَن كَانَ عَدُوًّا لِّجِبْرِيلَ فَإِنَّهُ نَزَّلَهُ عَلَىٰ قَلْبِكَ بِإِذْنِ اللَّهِ مُصَدِّقًا لِّمَا بَيْنَ يَدَيْهِ وَهُدًى وَبُشْرَىٰ لِلْمُؤْمِنِينَ﴾[1]، بڵێ: هەرکەس کە دوژمنی جوبرەئیلە (با بزانێ) هەر ئەوە کە ئەم قورئانە (بە ئیزنی خودا) ڕەوانەی دڵی تۆ دەکات و بە کتێبەکانی تری ئاسمانیش باوەڕ دەکات و ڕێنیشاندەرو مژدەدەرە بۆ ئەوانەی باوەڕدارن.

وە ئەفەرموێت: ﴿مِن قَبْلِ أَن تُنَزَّلَ التَّوْرَاةُ﴾ لە پێش ناردنەن خوارەوەی تەورات، واتە ئەوانەی لە خۆی حەرام کرد. منیش دەڵێم: پاش ئەمەی کە باس کرا دوو شت هەیە دەبێ لە بیری نەکەین، یەکەمیان: یەعقوب (سەلامی خوای لێ بێت) خۆشەویسترین شتی لە خۆی حەرام کردو وازی لێهێنا، ئەوە لە شەریعەتی ئەواندا شتێکی ئاسایی و دروست بووە. دووهەم شت: لە پێش ئەم باسەدا، باسی مەسیحیەکان کرا کە چۆن وەڵام درانەوەو باسی ئەو بیرو باوەڕە پڕوپوچەیان کرا لە بارەی عیساوە (سەلامی خوای لێ بێت) فێڵ و تەڵەکەیان سەری نەگرت و هەق و ڕاستی دەرکەوت دەربارەی عیساو دایکی کە چۆن خودا بە مەیل و توانای خۆی دروستی کردو ناردی بۆ نەوەی ئیسرائیل، کە بانگەواز بکات بۆ پەرستنی خودای تاک و تەنیا، ئیتر دێتە سەر وەڵام دانەوەی جولەکەکان وە باسی ئەو نەسخە دەکات کە ئەوان بڕوایان پێی نەبوو کە ڕوویدابێ و دروست بێ، خودای گەورە لە دەقێکا لە تەوراتدا کە کتێبی خۆیەتی هێناویەتی، نووح (سەلامی خوای لێ بێت) کاتێ لە کەشتیەکە هاتۆتە دەر، خودای گەورە هەموو گیانەوەرێکی لە زەویدا بۆ حەڵاڵ کرد کە لێی بخوات. پاشان یەعقوبیش(سەلامی خوای لەسەر بێت) گۆشتی وشترو شیرەکەی لە خۆی حەرام کرد. نەوەکانیشی پەیڕەوی ئەویان کرد لەوەدا، پاشان تەورات هات ئەوەی قەدەغە کردو زۆر شتی تریشی قەدەغە کرد. وە خودای گەورە ئیزنی ئادەمی دابوو کە کیژەکانی مارە بکات لە کوڕەکانی، پاشان ئەوەی قەدەغە کرد، وە لە شەریعەتی ئیبراهیمدا (سەلامی خوای لێ بێت) نهێنی نەدرکاندن ڕەوا بووە بۆ هاوسەر، ئیبراهیم بەکاریهێنا بۆ هاجەر کە شاردیەوە لە سارەی خێزانی. کەچی لە تەوراتدا ئەوە حەرام کرا. وە هەر بەو شێوەیە کۆکردنەوەی دوو خوشك ئاسایی و دروست بووە کە یەعقوب (سەلامی خوای لێ بێت) دوو

---

[1] البقرة (٩٧). أحمد (١/٢٧٨)، فەرموودەیەکی بەهێز نی یە.

خوشك هاوسەری بوون. پاشان هەر لە تەوراتدا لێیان قەدەغە کرا. ئەمانە هەموو لە تەوراتدا هاتوە بۆیان. ئەی ئەمانە نەسخ نیە، نەسخ کامەیە. وە هەر بەو شێوەیەش خودای گەورە هەندێ شتی بۆ عیسا (سەلامی خوای لێ بێت) حەلاڵ کرد کە لە تەوراتا حەرام کرا بوو، ئەی کە شوێنی ئەکەوتن چی دەڵێن؟ بەڵکو بڕواشیان پێ نەکردو دژایەتیشیان کرد. وە ئەو ئاینەی کە خودا بە موحەممەدا (ﷺ) ناردی کە ئاینێکی تێرو تەواوو ڕاستو دروست بوو، ئاینی باوکی ئیبراهیم، ئەی بۆچی بڕوای پێ ناهێنن؟ لەبەر ئەمەیە خودای گەورە ئەفەرموێت: ﴿كُلُّ ٱلطَّعَامِ كَانَ حِلًّا لِّبَنِىٓ إِسْرَٰٓءِيلَ إِلَّا مَا حَرَّمَ إِسْرَٰٓءِيلُ عَلَىٰ نَفْسِهِۦ مِن قَبْلِ أَن تُنَزَّلَ ٱلتَّوْرَىٰةُ﴾ واتە: هەرچی خواردن هەیە حەلاڵ بووە پێش هاتنە خوارەوەی تەورات مەگین ئەوەی کەیەعقوب(سەلامی خوای لێ بێت) حەرامی کرد. پاشان خودای گەورە ئەفەرموێت: ﴿قُلْ فَأْتُوا۟ بِٱلتَّوْرَىٰةِ فَٱتْلُوهَآ إِن كُنتُمْ صَٰدِقِينَ﴾ بڵێ: ئەگەر ڕاست دەکەن تەورات بێنن بیخوێننەوە، بێگومان ڕاستی قسەکەی ئێمە دەسەلمێنێ. ﴿فَمَنِ ٱفْتَرَىٰ عَلَى ٱللَّهِ ٱلْكَذِبَ مِنۢ بَعْدِ ذَٰلِكَ فَأُو۟لَٰٓئِكَ هُمُ ٱلظَّٰلِمُونَ﴾ ئینجا کەسانێ لەمەبەولا درۆ بە دەم خواوە بکەن. ئەوانە ستەمکارن. واتە: ئەوانەی درۆ بە دەم خوداوە هەڵدەبەستنو دەڵێن خودا شەممەی بۆ داناونو فەرمانی پێکردوون کە هەمیشە دەست بە تەوراتەوە بگرنو پێغەمبەرێکی تر ڕەوانە ناکات بانگەواز بکات بۆ ڕێی خودا بە بەڵگەو نیشانەوە دوای ئەوەی کە ڕوونمان کردۆتەوە، لە ڕوودانی نەسخو دەرکەوتنی ئەو شتانەی کە باسمان کرد. ﴿فَأُو۟لَٰٓئِكَ هُمُ ٱلظَّٰلِمُونَ﴾ بێگومان ئەوانە ئەم قسانە دەکەنو درۆ بە دەم خوداوە هەڵدەبەستن ستەمکارن. پاشان خودای گەورە ئەفەرموێت: ﴿قُلْ صَدَقَ ٱللَّهُ﴾ هەرچی خودا فەرموویەتی ئەوە ڕاستە. واتە: ئەی موحەممەد (ﷺ) ئەوەی خودا هەواڵی پێداوەو لە قورئاندا فەرموویەتی ڕاستە: ﴿فَٱتَّبِعُوا۟ مِلَّةَ إِبْرَٰهِيمَ حَنِيفًا وَمَا كَانَ مِنَ ٱلْمُشْرِكِينَ﴾ ئیتر ئێوە شوێنی ئاینی ئیبراهیم کەون. کە خودای تاکو تەنیای پەرستو هیچ هاوبەشی بۆ دانەنا. واتە: شوێنی ئاینی ئیبراهیم کەون کە خودا بڕیاری لەسەر داوە لەسەر زمانی موحەممەد (ﷺ) کە ئاینێکی هەقەو هیچ گومانێکی تێدا نیە. ئەو ڕێگایە کە هیچ پێغەمبەرێ لەمە تەواوترو ڕێكو پێك ترو ڕوونو ئاشکرا تری نەهێناوە وەك خودای گەورە لە ئایەتێکی تردا فەرموویەتی: ﴿قُلْ إِنَّنِى هَدَىٰنِى رَبِّىٓ إِلَىٰ صِرَٰطٍ مُّسْتَقِيمٍ دِينًا قِيَمًا مِّلَّةَ إِبْرَٰهِيمَ حَنِيفًا ۚ وَمَا كَانَ مِنَ ٱلْمُشْرِكِينَ﴾[1] تۆ بڵێ: پەروەردگاری من خستومیە سەر ڕاستە ڕێ، لەسەر دینێ کە پایەدارە، دینی ئەو ئیبراهیمە وا لە ناهەق لایداوەو هەرگیز هیچ شەریکێکی بۆ خوا بڕیار

[1] الانعام (١٦١).

نەداوە. وە ئەفەرموێت: ﴿ ثُمَّ أَوْحَيْنَآ إِلَيْكَ أَنِ ٱتَّبِعْ مِلَّةَ إِبْرَٰهِيمَ حَنِيفًا ۖ وَمَا كَانَ مِنَ ٱلْمُشْرِكِينَ ﴾[1] پاشان پێمان ڕاگەیاندی (ئەی موحەممەد (ﷺ)) کە: پەیڕەوی ئاینی ئیبراهیمی بەرەو هەق ڕۆشتوویە، ئەو لەگەڵ ئەوانە نەبوو کە شەریك بۆ خوا دادەنێن.

﴿إِنَّ أَوَّلَ بَيْتٍ وُضِعَ لِلنَّاسِ لَلَّذِى بِبَكَّةَ مُبَارَكًا وَهُدًى لِّلْعَٰلَمِينَ ﴿٩٦﴾ فِيهِ ءَايَٰتٌۢ بَيِّنَٰتٌ مَّقَامُ إِبْرَٰهِيمَ ۖ وَمَن دَخَلَهُۥ كَانَ ءَامِنًا ۗ وَلِلَّهِ عَلَى ٱلنَّاسِ حِجُّ ٱلْبَيْتِ مَنِ ٱسْتَطَاعَ إِلَيْهِ سَبِيلًا ۚ وَمَن كَفَرَ فَإِنَّ ٱللَّهَ غَنِىٌّ عَنِ ٱلْعَٰلَمِينَ ﴿٩٧﴾﴾

## کەعبەی پیرۆز یەکەم ماڵ بوو دانرا بۆ خواپەرستی

خودای گەورە ئەفەرموێت: ﴿إِنَّ أَوَّلَ بَيْتٍ وُضِعَ لِلنَّاسِ لَلَّذِى بِبَكَّةَ﴾ یەکەمین ماڵ کە بۆ خەڵکی دانراوە، هەر ئەوەیە وا لە مەککە. بۆ خواپەرستیو قوربانیو سوڕانەوە بە دەوریداو ڕووتێکردنی لە نوێژداو مانەوە تێدا دروس کراوە، ئەو کەعبەی کە ئیبراهیمی خەلیل دروستیکرد (سەلامی خوای لێ بێت) ئەو ئیبراهیمەی کە گاورو جولەکەکان وا خۆیان حیساب دەکەن لەسەر ئاینو پەیڕەوی ئەون. کەچی حەجی ئەو ماڵە ناکەن کە ئیبراهیم (سەلامی خوای لێ بێت) لەسەر ئەو فەرمانانەی کە خودا پێیدا دروستی کردو بانگی خەڵکی کرد کە بێن بۆ حەج کردن. لەبەر ئەوە خودای گەورە ئەفەرموێت: ﴿مُبَارَكًا وَهُدًى لِّلْعَٰلَمِينَ﴾ کە زۆر بە پیتەو پیرۆزەو نیشانگەی خواناسیە بۆ هەموو خەڵکی دنیا. ئیمامی ئەحمەد ڕیوایەتی کردووە لە ئەبوزەڕەوە (ڕەزای خوای لێ بێت) وتی: وتم: ئەی پێغەمبەری خودا (ﷺ) کام مزگەوت یەکەم مزگەوتە لەسەر زەویدا دامەزراوە؟ فەرمووی: (مزگەوتی حەرام) وتم: پاشان کام؟ فەرمووی: (مزگەوتی ئەقسا) وتم: ماوەی نێوانیان چەندە؟ فەرمووی: (چل ساڵ) وتم: پاشان کام؟ فەرمووی: (لە هەر شوێنێکیش کاتی نوێژ هات نوێژ بکە، هەمووی مزگەوتە).[2] (واتە: زەوی هەمووی مزگەوتە) بوخاریو موسلیمش ڕیوایەتیان کردووە[3].

## هۆی ناونانی مەککە بە بەککەو ناوەکانی مەککە

خودای گەورە ئەفەرموێت: ﴿لَلَّذِى بِبَكَّةَ﴾ هەر ئەوەیە وا لە مەککە. (بكة) یەکێکە لە ناوەکانی مەککە وەك بەناوبانگە. وتراوە: ناونراوە بەککە لەبەر ئەوە ملی ستەمکارانو زۆردارانی نەوی کردو سەری پێ شۆڕ کردوون. وترایشە: (يتباكون فيها) واتە: قەرەباڵغیان تیا بەدی کردووەو ئاپورەیان

---

[1] النحل (١٢٣).

[2] أحمد (٥/١٥٠)، فەرموودەیەکی سەحیحە.

[3] فتح الباري (٦/٤٦٩)، مسلم (١/٣٧٠).

تیا بەستوە. مەککە ناوی زۆری هەبوەو باس کراوە کە ئەمانەن: (بكة، و البيت العتيق، و البيت الحرام، و البلد الامين، و أم رحم، و أم القرى، و صلاح، و العرش على وزن بدر، و القادس تطهر من الذنوب، و المقدسة، و الناسة بالنون و الباء- الباسة- أيضاً، و الحاطمة، و النسّسة، و الرأس، و كوثى، و البلدة، و البنية، و الكعبة).

### شوێنەواری (مقام) ئیبراهیم

خوادای گەورە ئەفەرموێت: ﴿فِيهِ ءَايَٰتٌۢ بَيِّنَٰتٌ﴾ چەند بەڵگەو نیشانەیەکی ڕوونی تێدایە دەیسەلمێنێ کە ئیبراهیم دروستی کردووە، خودای گەورەیش قەدرو ڕێزی لێناوە. پاشان ئەفەرموێت: ﴿مَّقَامُ إِبْرَٰهِيمَ﴾ لەوێدا شوێنەواری ئیبراهیمی هەیە. واتە: کاتێ کە خانوەکە بەرز بوەتەوە پشتی بەو شوێنەوارە بەستوە بۆ بەرز کردنەوەی دیوارەکان لەوێوەو لەسەری ڕاوەستاوە ئیسماعیلی کوڕی هاوکاری کرد. ئەو شوێنەوارە (مقام) پاڵی دابوو بە دیواری کەعبەی پیرۆزەوە، هەتا ئەو کاتە عومەری کوڕی خەتاب (ڕەزای خوای لێ بێت) لە خیلافەتی خۆیدا خستیە دواوە بۆ ڕووی خۆرهەڵات، بۆ ئەوەی بتوانرێ لەوێوە تەواف بکرێو شپرزەییو جەنجاڵی بۆ نوێژکەران دروست نەکات دوای تەواف کردن لەوێدا. چونکە خودای گەورە فەرمانی پێداوین کە نوێژ لەوێدا بکەینو ئەفەرموێت: ﴿وَٱتَّخِذُواْ مِن مَّقَامِ إِبْرَٰهِـۧمَ مُصَلًّى﴾[1] جێیی ئیبراهیم بکەن بە جێ نوێژی خۆتان. چەند فەرموودەمان لەو بارەیەوە لە پێشەوە هێنا پێویست ناکات لێرەدا دووبارەی بکەینەوە، عەوفی وتی: لە ئیبنوعەبباسەوە لەم ئایەتەدا: ﴿فِيهِ ءَايَٰتٌۢ بَيِّنَٰتٌ مَّقَامُ إِبْرَٰهِيمَ﴾ لەو نیشانە ئاشکرانە شوێنەواری ئیبراهیمو مەشعەرە(المَشعَر)[2]، موجاهید وتی: جێ پێی لەو (المقام)دا نیشانەیەکی ئاشکرایە[3]، هەر بەم شێوەیە ڕیوایەت کراوە لە عومەری کوڕی عەبدولعەزیزو حەسەنو قەتادەو سوودیو موقاتیلی کوڕی حەیانو کەسانی تریشەوە[4] ئەبوتالیب لە هۆنراوە لامیە بەناوبانگەکەیدا وتی:

و موطئ إبراهيم في الضجر رطبة　　　على قدميه حافياً غير ناعل.

واتە: جێ پێی ئیبراهیم لەسەرئەو بەردەدیارە کەهەردوو پێی پێخاوس بوەو نەعلی لە پێدا نەبووە.

---

[1] البقرة (١٢٥).

[2] الطبري (٢٦/٧).

[3] الطبري (٢٧/٧).

[4] إبن أبي حاتم (٤١٢/٢-٤١٣).

## حەرەم شوێنێکی بێ ترس بووە

خودای گەورە ئەفەرموێت: ﴿وَمَن دَخَلَهُۥ كَانَ ءَامِنًا﴾ هەرکەسێ چوبێتە ناویەوە هیچ ترسێکی نەبووە. واتە: هەرکەسێ ترسا بێ کە چووبێتە حەرەمی مەککە هیچ ترسێکی لە خۆی نەماوە، لە چەرخی نەفامیشدا هەر وا بووە. وەك حەسەنی بەسری‌و کەسانی تریش وتویانە: پیاوێ کەسێکی دەکوشت شتێکی دەکردە ملی سوفەیان(صوفة) پێ دەوت: دەچووە ناو حەرەمی مەککە، کوڕی پیاوە کوژراوەکەی پێدەگەیی، پەلاماری نەئەداو هیچی لەگەڵا نەدەکرد هەتا لە حەرەمی مەککە دەچووە دەرەوە خودای گەورەیش فەرموویەتی: ﴿أَوَلَمْ يَرَوْا أَنَّا جَعَلْنَا حَرَمًا ءَامِنًا وَيُتَخَطَّفُ ٱلنَّاسُ مِنْ حَوْلِهِمْ﴾[1] ئایا نابینن مەککەمان بۆ کردونەتە شوێنی هێمن، کە خەڵکی دەوروبەریشیان دەڕفێنرێن؟ وە ئەفەرموێت: ﴿فَلْيَعْبُدُوا۟ رَبَّ هَٰذَا ٱلْبَيْتِ ۝٣ ٱلَّذِىٓ أَطْعَمَهُم مِّن جُوعٍ وَءَامَنَهُم مِّنْ خَوْفٍۭ﴾[2] کە ئەوانی لە برسیەتی ڕزگار کردو دڵنیای کردن لە ترس. وە لە ڕیزی ئەو شتانەی کە لە حەرەمی مەککەدا قەدەغە کرابوو، ڕاوکردنی نێچیرەکانی‌و دەرکردنیان لە هێلانەکانیان‌و بڕینی دارەکانی‌و هەڵکەندنی گیاو گژەی وەك لە فەرموودەی سەحیحا هاتوە لەو بارەیەوە لە کۆمەڵێ لە هاوەڵەکانی پێغەمبەرەوە (ﷺ) بە مەرفوعی‌و بە مەوقوفی. وە لە هەردوو سەحیحەکەدا هاتووە لە ئیبنوعەبباسەوە (ڕەزای خوایان لێ بێت) وتی: پێغەمبەری خودا (ﷺ) لە ڕۆژی فەتحا، واتە: فەتحی مەککە. فەرموویەتی: (لە دوای فەتحەوە کۆچکردن نیە، بەڵکو جیهادو لێبڕان هەیە هەر کاتێ داواتان لێ کرا بچن بۆ جیهاد بڕۆن) وە لە ڕۆژی فەتحا، واتە ڕۆژی فەتحی مەککە فەرمووی: (بێگومان ئەم شارە خودا لەو ڕۆژە کە ئاسمانەکان‌و زەمینی دروست کردووە قەدەغەی کردووە، هەر قەدەغەیە بەو شێوەی کە خودا قەدەغەی کردووە هەتا ڕۆژی قیامەت. وە بێگومان لە پێش مان شەڕ کردن بۆ هیچ کەسێ حەڵاڵ نەبووە، وە حەڵاڵیش نیە بۆ من تەنیا ساتێ نەبێ لە ڕۆژا، بێگومان قەدەغەیشە، بەو قەدەغە کردنەی کە خودا کردوویەتی هەتا ڕۆژی قیامەت. دڕکی نابڕێ‌و نێچیری ڕاونانرێ. دۆزراوەی هەڵناگیرێ مەگین کەسێ بانگەوازی بۆ بکات گژو گیاشی نابڕێ) عەبباس وتی: ئەی پێغەمبەری خودا (ﷺ) جگە لە (الإِذْخِرَ)[3] کە بەکاری دەهێنن بۆ قەینەو ماڵەکانیان، فەرمووی: (جگە لە (الإِذْخِرَ))[4] دیسان بوخاری‌و موسلیم ڕیوایەتیان کردووە لە ئەبوشورەیحی عەدەویەوە کە وتویەتی بە عەمری

---

[1] العنكبوت (٦٧).

[2] قريش (٣-٤).

[3] الإِذْخِرَ: ڕووەکێکی گیایی یە لە جۆری نەجلیاتە (النجليات) بۆنێکی خۆشی لیمۆیی هەیە.

[4] فتح الباري (٤/٥٦)، مسلم (٢/٩٨٦).

کوڕی سەعید، کە نێرراوەکانی ڕەوانەکرد بۆ مەککە، ڕێم پێبدە قسەیەکت بۆ باس بکەم کە لە بەیانی ڕۆژی فەتحا پێی هەڵساوە. بەم گوێیانەی خۆم گوێم لێبوو، دڵم لێی بە ئاگا بوو، بە چاوی خۆم بینیم، کاتێ کە ئەو قسەی ئەفەرموو. پێغەمبەر (ﷺ) سوپاس‌و ستایشی خودای کردو پاشان فەرمووی: (بێگومان خودا مەککەی قەدەغە کردووە، بەڵام خەڵکی قەدەغەیان نەکرد. ڕەوا نیە بۆ هیچ کەسێ کە بڕوای بە خوداو بە ڕۆژی دوایی هەیە کە خوێنی تیا بڕێژێ، درەختی ببڕێ، ئەگەر کەسێ وتی: ڕێگە درا بە شەڕی پێغەمبەری خودا (ﷺ) تێیدا، پێی بڵێن: خودای گەورە ئیزنی پێغەمبەرەکەی داوە، بەڵام ئیزنی ئێوەی نەداوە. بێگومان تەنیا ساتێ لە ڕۆژێك ئیزنی منی تێیدا. قەدەغە کردنەکەی ئەمڕۆ گەڕاوەتەوە وەك دوێنێ. ئەوس ئەوەی ئامادەیە با ئەوەی ئامادە نیە ئاگاداری بکات) وترا بە ئەبوشورەیح عەمر چی بە تۆ وت؟ وتی: من لەو بارەیەوە لە تۆ ئاگادار ترم ئەی ئەبوشورەیح. بێگومان حەرەمی مەککە پەنای یاخی ناداو ئەوەی لە خوێن ڕایکردبێ‌و ئەوەیش دزی کردبێ. بەتایبەتی ئەوەی وشتری فراندبێ هەر پەنا نادرێ.[1] لە جابیرەوە (ڕەزای خوای لێ بێت) وتی: لە پێغەمبەری خودام بیست (ﷺ) ئەیفەرموو: (بۆ کەستان دروست نیە کە چەك هەڵگرن لە مەککەدا)[2] موسلیم ڕیوایەتی کردووە. وە لە عەبدوڵلای کوڕی عەدی کوڕی حەمرائی زەهریەوە کە گوێی لە پێغەمبەری خودا بووە (ﷺ) کە لەسەر حەزوەرە ڕاوەستا بوو لە بازاڕی مەککەدا ئەیفەرموو: (سوێند بە خوا تۆ چاکترین زەوی خودای، وە تۆ خۆشەویستترین زەوی خای لە لای خودا، وە ئەگەر دەریان نەکردمایە لە تۆ دەرنەئەچووم)[3] ئیمامی ئەحمەدو تیرمیزی‌و نەسائی‌و ئیبنوماجە ڕیوایەتیان کردووە[4] تیرمیزی وتی: فەرموودەیەکی حەسەنی سەحیحە.

### باسی واجب بوونی حەج

خودای گەورە ئەفەرموێت: ﴿وَلِلَّهِ عَلَى ٱلنَّاسِ حِجُّ ٱلْبَيْتِ مَنِ ٱسْتَطَاعَ إِلَيْهِ سَبِيلًا﴾ خودا حەجی بڕیار داوە بۆ هەرکەسێ کە بۆی بلوێ. ئەم ئایەتە حەجی واجب کردووە. چەندین فەرموودە هاتووە لە بارەی حەجەوە کە یەکێکە لە پایەکانی ئیسلام‌و بنچینەو بنەماکانی، هەموو زانایان یەك دەنگن لەسەر واجب بوونی. واجبە لەسەر ئەو کەسانەی توانایان هەیە لە تەمەنیاندا جارێ حەج بکەن بە دەقی قورئان‌و فەرموودەو کۆدەنگی زانایان. ئیمامی ئەحمەد ڕیوایەتی کردووە لە ئەبوهورەیرەوە وتی: پێغەمبەری خودا(ﷺ) وتارێکی بۆ دایەن‌و فەرمووی: (خەڵکینە خودای گەورە حەجی لەسەر فەرز

---

[1] مسلم (٢/٩٨٧).

[2] مسلم (٢/٩٨٩).

[3] أحمد (٤/٣٠٥)، فەرموودەیەکی سەحیحە.

[4] تحفة الاحوذي (١٠/٤٢٦)، النسائي في الكبرى (٢/٤٧٩)، إبن ماجة (٢/١٠٣٧)، سەحیحە.

کردوون حەج بکەن) پیاوێك وتی: هەموو ساڵێك ئەی پێغەمبەری خودا (ﷺ)؟ پێغەمبەر (ﷺ) بێدەنگ بوو هەتا پیاوەکە سێ جار دووبارەی کردەوە، پێغەمبەر فەرمووی: (ئەگەر بموتایە بەڵێ، فەرز دەبوو لەسەرتان و نەشتان دەتوانی ئەنجامی بدەن) پاشان فەرمووی: (وازم لێبێنن ئەوەندە لە شت مەکۆڵنەوە چونکە ئەوانەی پێش ئێوە تیاچوون بەهۆی پرسیار زۆر کردن و لە فەرمان دەرچوونی پێغەمبەرەکەیانەوە، ئەگەر فەرمانی شتێکم پێکردن چەندەتان توانی ئەنجامی بدەن، ئەگەر ڕێگری شتێکم لێ کردن دەستبەرداری ببن و وازی لێ بهێنن)[1] موسلیمش هەر وا ڕیوایەتی کردووە[2].

## مانای توانا بۆ لوان (الاستطاعة)

دەربارەی توانا چەند بەشێکە: جاری وا هەیە ئەو کەسە خۆی توانای هەیە حەج بکات، جاری وایش هەیە پەیوەندی بە غەیرەز خۆیەوە هەیە، وەك لە کتێبەکانی شەرعا هاتووە. تیرمیزی ڕیوایەتی کردووە لە ئیبنوعومەرەوە(ڕەزای خوایان لێ بێت) وتی: پیاوێ هەڵساو چووە خزمەتی پێغەمبەری خوداو (ﷺ) وتی: حاجی کێیە ئەی پێغەمبەری خودا (ﷺ)؟ فەرمووی: ئەوەیە کە قژ گژو چڵکنە، یەکێکی تر هەڵساو وتی: کام حەج چاکترە ئەی پێغەمبەری خودا (ﷺ)؟ فەرمووی: (ئەوەی دەنگی بەرز دەکاتەوەو خوێنی قوربانیەکەی دەڕێژێ) یەکێکی تریش هەڵسا وتی: ئەی ڕێگە چیە؟ ئەی پێغەمبەری خودا (ﷺ)؟ فەرمووی: توێشوو هەلگرتن و وشتری سواری[3]، ئیبنوماجەیش ڕیوایەتی کردووە[4]. حاکم ڕیوایەتی کردووە لە ئەنەسەوە کە پێغەمبەری خودا (ﷺ) پرسیاری لێ کرا لە بارەی ئەم ئایەتەوە: ﴿مَنِ ٱسْتَطَاعَ إِلَيْهِ سَبِيلًا﴾ وترا: ئەی ڕێگە چیە؟ فەرمووی: (توێشوو هەلگرتن و ولاغی سواری)[5] (واتە: ئەو کەسە کە دەچێت بۆ حەج توانای ڕۆشتن و گەڕانەوەی هەبێ) ئیمامی ئەحمەد ڕیوایەتی کردووە لە ئیبنوعەبباسەوە وتی: پێغەمبەری خودا (ﷺ) فەرموویەتی: (هەرکەسێ ویستی حەج بکات با پەلە بکات)[6] ئەبوداودیش ڕیوایەتی کردووە[7].

---

[1] أحمد (٢/٥٠٨)، فەرموودەیەکی سەحیحە.

[2] مسلم (٢/٩٧٥).

[3] تحفة الاحوذي (٨/٣٤٨)، ئەم فەرموودەیە لە حەسەن دەچێ.

[4] إبن ماجة (٢/٩٦)، ئەم فەرموودەیە لە حەسەن دەچێت.

[5] الحاكم (١/٤٤٢)، ئەم فەرموودەیە لە حەسەن دەچێت.

[6] أحمد (١/٢٢٥)، سەنەدەکانی لاوازە.

[7] أبوداود (٢/٣٥٠)، سەنەدەکانی لاوازە.

**ئەوەی بڕوای بە حەج نەبێ خوانەناسە**

خودای گەورە ئەفەرموێت: ﴿وَمَن كَفَرَ فَإِنَّ ٱللَّهَ غَنِىٌّ عَنِ ٱلْعَـٰلَمِينَ﴾ هەرکەسێکیش حاشا بکات، خودا لە هەموو خەڵکی دنیا بێ نیازە. ئیبنوعەبباس و موجاهیدو کەسانی تریش وتویانە: هەرکەسێ ئینکاری فەرزی حەج بکات ئەوە بوەتە خوانەناس، خودا بێ نیازە لێی، ئەبوبەکر کە ئیسماعیلی حافیزە ڕیوایەتی کردووە لە عومەری کوڕی خەتابەوە (ڕەزای خوای لێ بێت) وتی: هەرکەسێ تواناو دەستەڵاتی حەجی هەبێ و حەج نەکا، یەکسانە بۆی بە گاوری بمرێ یان بە جوولەکەیی، ئەمە سەنەدێکی ڕاستە بۆ لای عومەری کوڕی خەتاب (ڕەزای خوای لێ بێت)[1].

﴿قُلْ يَـٰٓأَهْلَ ٱلْكِتَـٰبِ لِمَ تَكْفُرُونَ بِـَٔايَـٰتِ ٱللَّهِ وَٱللَّهُ شَهِيدٌ عَلَىٰ مَا تَعْمَلُونَ ﴿٩٨﴾ قُلْ يَـٰٓأَهْلَ ٱلْكِتَـٰبِ لِمَ تَصُدُّونَ عَن سَبِيلِ ٱللَّهِ مَنْ ءَامَنَ تَبْغُونَهَا عِوَجًا وَأَنتُمْ شُهَدَآءُ وَمَا ٱللَّهُ بِغَـٰفِلٍ عَمَّا تَعْمَلُونَ ﴿٩٩﴾﴾

**سەرزەنشتکردنی ئەهلی کتێب لەسەر خوانەناس و دژایەتی کردنیان و ڕاوەستانیان لە ڕێی خودا**

خودای گەورە ئەفەرموێت: ﴿قُلْ يَـٰٓأَهْلَ ٱلْكِتَـٰبِ لِمَ تَكْفُرُونَ بِـَٔايَـٰتِ ٱللَّهِ وَٱللَّهُ شَهِيدٌ عَلَىٰ مَا تَعْمَلُونَ ﴿٩٨﴾ قُلْ يَـٰٓأَهْلَ ٱلْكِتَـٰبِ لِمَ تَصُدُّونَ عَن سَبِيلِ ٱللَّهِ مَنْ ءَامَنَ تَبْغُونَهَا عِوَجًا وَأَنتُمْ شُهَدَآءُ وَمَا ٱللَّهُ بِغَـٰفِلٍ عَمَّا تَعْمَلُونَ﴾ واتە: بڵێ: ئەی ئەهلی کتێب، بۆچی لە نیشانەکانی خودا حاشا دەکەن؟ خودا لە کردەوەی ئێوە ئاگادارە. بڵێ: ئێوەی ئەهلی کتێب، لەبەرچی باوەڕدارەکان لە ڕێگەی خودا لائەدەن و دەتانەوێ ئەم ڕێگایە لارو نارێك نیشان بدەن؟ خۆشتان باش دەزانن خودایش لەوەی ئێوە دەیکەن ئاگادارە. ئەمە هەڕەشەیە لە لایەن خوداوە لەو خوانەناسانەی ئەهلی کتێب لەسەر سەرپێچی کردنیان لە هەق و بڕوانەهێنانیان بە نیشانەکانی خوداو ڕاوەستانیان لە ڕێگەی خوداو ڕێگریان لەو کەسانەی ڕێگەی ڕاستیان گرتۆتە بەر بە گشت تواناو دەستەڵاتێکیانەوە کە چاکیش دەزانن ئەوەی ئەو پێغەمبەرە هێناویەتی ڕاستەو لەلایەن خوداوەیە. بەپێی ئەو شارەزاییەی کە بۆیان هاتوەو وەریان گرتبوو لە پێغەمبەرە پێشوەکانەوە (سەلامی خوایان لێ بێت) مژدەیان پێدابوون بە هاتنی و پێیان ڕاگەیاندبوون کە پێغەمبەرێکی نەخوێندەواری عەرەب لە نەوەی هاشم لە مەککە پەیدا دەبێ و گەورەی نەوەی ئادەمەو دوایین پێغەمبەرە، پێغەمبەری خودای زەوی و ئاسمانە. خودای گەورە هەڕەشەی لێ کردوون لەسەر ئەو کردارانەیان و گوێڕایەڵی نەکردنی ئەو کتێبانەی لەبەر دەستیاندایە کە لە پێغەمبەرەکانیانەوە بۆیان هاتبوو، دژایەتی کردنی ئەو پێغەمبەرەی کە ئەوان مژدەیان پێداون بە هاتنی و بە ڕاستی نازانن و حاشای لێ دەکەن و دژی دەوەستن. خودای گەورە پێیان ڕادەگەیەنێ کە بێ

[1] الحلية (٩/٢٥٢).

ئاگا نیە لەو کردارانەیان، بەو زوانە تۆڵەیان لێ دەسێنێ لەسەری ﴿يَوۡمَ لَا يَنفَعُ مَالٞ وَلَا بَنُونَ﴾[1] ئەو ڕۆژە کە ماڵو منداڵ بەکار نایە.

﴿يَـٰٓأَيُّهَا ٱلَّذِينَ ءَامَنُوٓاْ إِن تُطِيعُواْ فَرِيقٗا مِّنَ ٱلَّذِينَ أُوتُواْ ٱلۡكِتَـٰبَ يَرُدُّوكُم بَعۡدَ إِيمَـٰنِكُمۡ كَـٰفِرِينَ ﴿١٠٠﴾ وَكَيۡفَ تَكۡفُرُونَ وَأَنتُمۡ تُتۡلَىٰ عَلَيۡكُمۡ ءَايَـٰتُ ٱللَّهِ وَفِيكُمۡ رَسُولُهُۥۗ وَمَن يَعۡتَصِم بِٱللَّهِ فَقَدۡ هُدِيَ إِلَىٰ صِرَٰطٖ مُّسۡتَقِيمٖ ﴿١٠١﴾﴾

**هۆشیار کردنەوەی موسوڵمانان لە گوێڕایەڵی کردنی ئەهلی کتێب**

خودای گەورە عەبدە خاوەن باوەڕەکانی دەترسێنێ لەوەی کە بە گوێی گرۆیەك لە ئەهلی کتێب بکەن کە حەسوودی بە خاوەن باوەڕان دەبەن لەسەر ئەو ڕێزو چاکەی خودا لەگەڵی کردوون‌و ئەو پێغەمبەرەی خۆی بە خەڵات بۆ ناردوون وەك ئەفەرموێت: ﴿وَدَّ كَثِيرٞ مِّنۡ أَهۡلِ ٱلۡكِتَـٰبِ لَوۡ يَرُدُّونَكُم مِّنۢ بَعۡدِ إِيمَـٰنِكُمۡ كُفَّارًا حَسَدٗا مِّنۡ عِندِ أَنفُسِهِم﴾[2] زۆر کەس لە خاوەن کتێبەکان، چونکە ئیرەیتان پێدەبەن، حەز دەکەن لە پاش باوەڕ هێنانتان پەشیمانتان بکەنەوە. لێرەیشدا هەروا ئەفەرموێت: ﴿يَـٰٓأَيُّهَا ٱلَّذِينَ ءَامَنُوٓاْ إِن تُطِيعُواْ فَرِيقٗا مِّنَ ٱلَّذِينَ أُوتُواْ ٱلۡكِتَـٰبَ يَرُدُّوكُم بَعۡدَ إِيمَـٰنِكُمۡ كَـٰفِرِينَ﴾ ئەی کۆمەڵی خاوەنباوەڕان ئەگەر بە قسەی هەندێك لەوانەی ئەهلی کتێبن دەسخەڕۆ بن، لە پاش باوەڕهێنانتان دەتانکەنەوە خوانەناس. پاشان خودای گەورە ئەفەرموێت: ﴿وَكَيۡفَ تَكۡفُرُونَ وَأَنتُمۡ تُتۡلَىٰ عَلَيۡكُمۡ ءَايَـٰتُ ٱللَّهِ وَفِيكُمۡ رَسُولُهُۥۗ وَمَن يَعۡتَصِم بِٱللَّهِ فَقَدۡ هُدِيَ إِلَىٰ صِرَٰطٖ مُّسۡتَقِيمٖ﴾ جا چۆن ئێوە حاشا دەکەن، کەچی ئایەتەکانی خواتان بەسەردا دەخوێنرێتەوە و پێغەمبەرتان لەناودایە؟ واتە: خوانەناسی زۆر دوورە لە ئێوەوە، ئێوەش زۆر دوورە پەرێزن لە خوانەناسی، چونکە ئایەتەکانی خودا بە ڕۆژو بە شەو بۆتان دێتە خوارەوەو پێغەمبەریش (ﷺ) دەخوێنێتەوەو پێتان ڕادەگەیەنێ، ئەم ئایەتە وەك ئەو ئایەتە وایە کە خودای گەورە ئەفەرموێت: ﴿وَمَا لَكُمۡ لَا تُؤۡمِنُونَ بِٱللَّهِ وَٱلرَّسُولُ يَدۡعُوكُمۡ لِتُؤۡمِنُواْ بِرَبِّكُمۡ وَقَدۡ أَخَذَ مِيثَـٰقَكُمۡ إِن كُنتُم مُّؤۡمِنِينَ﴾[3] ئایا چیتانە باوەڕ ناکەن بە خودا؟ کەچی پێغەمبەریش داواتان لێدەکات. تا بە پەروەردگاری خۆتان بڕوا بێنن. ئێوە پەیمانتان پێداوە، ئەگەر خاوەن باوەڕن. وەك لەم فەرموودەیەدا هاتووە کە پێغەمبەر (ﷺ) ڕۆژێ فەرمووی بە هاوەڵەکانی: کام لە خاوەن باوەڕان، بڕواکەی سرنجتان ڕادەکێشێ؟ وتیان: فریشتەکان. فەرمووی: ئەوانە چۆن بڕوا ناهێنن کە

---

[1] الشعراء (٨٨).

[2] البقرة (١٠٩).

[3] الحديد (٨).

لەلای پەروەردگاریانن؟ باسی پێغەمبەرانیشیان کرد، پێغەمبەر (ﷺ) فەرمووی: چۆن بڕوا ناهێنن و نیگا بۆ سەریان دادەبەزێ؟ وتیان: ئەی ئێمە فەرمووی: چۆن ئێوەش بڕوا ناهێنن من لە نێوان ئێوەدام؟ وتیان: کام خەڵکە بڕواکەی جێی سەرسوڕمانە؟ فەرمووی: کۆمەڵێکن دوای ئێوە دێن، نامەیەکیان دەس دەکەوێ، بڕوا دێنن بەوەی لەناویدایە[1]، پاشان خودای گەورە ئەفەرموێت: ﴿وَمَن يَعْتَصِم بِاللَّهِ فَقَدْ هُدِيَ إِلَىٰ صِرَاطٍ مُّسْتَقِيمٍ﴾ هەرکەس پشت بە خوا ببەستێ، کەوتۆتە سەر ڕاستە ڕێگە. واتە: پشت بەستن بە خواو پەنا گرتن پێی بنچینەو کۆڵەکەی ڕاستە ڕێیەو چەکو کەرەسەی خۆ لادانە لە گومڕاییو هۆکارە بۆ شارەزاییو گرتنە بەری ڕێی ڕاستو گەیشتن بە ئاوات.

﴿يَا أَيُّهَا الَّذِينَ آمَنُوا اتَّقُوا اللَّهَ حَقَّ تُقَاتِهِ وَلَا تَمُوتُنَّ إِلَّا وَأَنتُم مُّسْلِمُونَ ﴿١٠٢﴾ وَاعْتَصِمُوا بِحَبْلِ اللَّهِ جَمِيعًا وَلَا تَفَرَّقُوا وَاذْكُرُوا نِعْمَتَ اللَّهِ عَلَيْكُمْ إِذْ كُنتُمْ أَعْدَاءً فَأَلَّفَ بَيْنَ قُلُوبِكُمْ فَأَصْبَحْتُم بِنِعْمَتِهِ إِخْوَانًا وَكُنتُمْ عَلَىٰ شَفَا حُفْرَةٍ مِّنَ النَّارِ فَأَنقَذَكُم مِّنْهَا كَذَٰلِكَ يُبَيِّنُ اللَّهُ لَكُمْ آيَاتِهِ لَعَلَّكُمْ تَهْتَدُونَ ﴿١٠٣﴾﴾

### کامەیە هەقی لەخوا ترسان

خودای گەورە ئەفەرموێت: ﴿يَا أَيُّهَا الَّذِينَ آمَنُوا اتَّقُوا اللَّهَ حَقَّ تُقَاتِهِ﴾ ئەی کۆمەڵی خاوەن باوەڕان چۆن پێویستە، ئاوا لە خوا بترسن. ئیبنوئەبی حاتەم ڕیوایەتی کردووە لە عەبدوڵڵای کوڕی مەسعودەوە ﴿اتَّقُوا اللَّهَ حَقَّ تُقَاتِهِ﴾ وتی: گوێڕایەڵی کردنو یاخی نەبوون لێیو یادی بکرێو لەبیر نەکرێو شوکر بکرێو پێ نەزانی بەرانبەر نەکرێ[2] سەنەدەکەی ڕاستەو مەوقوفە. حاکم لە موستەدرەکەکەیدا ڕیوایەتی کردووە لە ئیبنومەسعودەوە بە مەرفوعی پاشان وتی: لەسەر مەرجی بوخاریو موسلیم سەحیحە بەڵام ئەوان نەیانهێناوە[3] بەڵام ڕاستتر ئەوەیە کە فەرموودەیەکی مەوقوفە. والله أعلم. ڕیوایەت کراوە لە ئەنەسەوە کە وتویەتی، هیچ عەبدێ چۆن پێویستە لە خوا ناترسێ هەتا زمانی بەند نەکاتو نەیبەستێ[4] پاشان خودای گەورە ئەفەرموێت: ﴿وَلَا تَمُوتُنَّ إِلَّا وَأَنتُم مُّسْلِمُونَ﴾ هەر بەموسوڵمانی بمرن. واتە: پارێزگاری لە ئیسلام بکەن لە کاتی تەندروستی و دڵنیایتاندا بۆئەوەی لەسەر ئەوە بمرن، چونکە پیاوی بەڕێزو دەست گوشاد هەمیشە لەسەر دەست گوشادی خۆی بەردەوامە، هەرکەسیش لەسەر هەر حاڵێ ژیا لەسەر ئەوەیش دەمرێ. پەنا بە خوا بە پێچەوانەی ئەوە.

---

[1] الطبراني (٤/٢٢-٢٣).

[2] إبن أبي حاتم (٢/٤٤٦).

[3] الحاكم (٢/٢٩٤).

[4] إبن أبي حاتم (٢/٤٤٨).

ئیمامی ئەحمەد ڕیوایەتی کردووە لە موجاهیدەوە وتویەتی: خەڵکی بە دەوری کەعبەدا تەوافیان دەکرد، ئیبنوعەبباس دانیشتبوو میحجەنی لەگەڵا بوو وتی: پێغەمبەری خودا (ﷺ) فەرمووی: ﴿يَـٰٓأَيُّهَا ٱلَّذِينَ ءَامَنُوا۟ ٱتَّقُوا۟ ٱللَّهَ حَقَّ تُقَاتِهِۦ وَلَا تَمُوتُنَّ إِلَّا وَأَنتُم مُّسْلِمُونَ﴾ ئەگەر دڵۆپێ لە زەقنەموت دڵۆپەی بکردایە ژیانی خەڵکی سەر زەوی تاڵ دەکرد ئەی بۆ ئەوانەی هیچ خواردنێکیان نیە جگە لە زەقنەموت دەبێ چۆن بێ[1]؟ تیرمیزیو نەسائیو ئیبنوماجەو ئیبنوحیبانو حاکیم لە موستەدرەکەکەیدا هەر وا ڕیوایەتیان کردووە، تیرمیزی وتی: فەرموودەیەکی حەسەنی سەحیحە، حاکیم وتی: لەسەرمەرجی بوخاریو موسلیم سەحیحە بەڵام ئەوان نەیانهێناوە[2] دیسان ئیمامی ئەحمەد ڕیوایەتی کردووە لە جابیرەوە وتی: بیستم لە پێغەمبەری خودا (ﷺ) سێ ڕۆژ پێش مردنی ئەیفەرموو: (با هەرکەسێکتان دەمرێت گومانی باش بە خودای گەورە ببات)[3] موسلیمش ڕیوایەتی کردووە[4]. وە لە هەردوو سەحیحەکەدا هاتووە لە ئەبوهورەیرەوە وتی: پێغەمبەری خودا (ﷺ) فەرمووی: (خودای گەورە ئەفەرموێت: من لەگەڵ گومانی عەبدی خۆمم کە پێم دەبات)[5].

### فەرماندان بە دەس گرتن بە پەیمانی خوداوەو پابەند بوون بە کۆمەڵەوە

خودای گەورە ئەفەرموێت: ﴿وَٱعْتَصِمُوا۟ بِحَبْلِ ٱللَّهِ جَمِيعًا وَلَا تَفَرَّقُوا۟﴾ هەمووتان دەس بگرن بە پەیمانی خوداو بڵاوە مەکەن. وتراوە ﴿بِحَبْلِ ٱللَّهِ﴾ واتە: بە پەیمانو بەڵێنی خوداوە. وەك لە ئایەتی دوای ئەم ئایەتەوە خودای گەورە ئەفەرموێت: ﴿ضُرِبَتْ عَلَيْهِمُ ٱلذِّلَّةُ أَيْنَ مَا ثُقِفُوٓا۟ إِلَّا بِحَبْلٍ مِّنَ ٱللَّهِ وَحَبْلٍ مِّنَ ٱلنَّاسِ﴾[6] لە هەر کوێ بن، هەر زۆر چەپۆکی و ڕسوایی بۆتە بەشیان جا مەگین هەر پەیمان لەگەڵ خوداو خەڵکا بگاتە فریایانەوە. ﴿وَلَا تَفَرَّقُوا۟﴾ بڵاوە مەکەن. خودای گەورە فەرمانیان پێدەکات کە پابەند بە کۆمەڵی موسوڵمانانەوەو لە یەك جیا نەبنەوە. فەرموودەی زۆر هاتوە کە قەدەغەی لەیەك جیا بوونەوەی کردووەو فەرمانی داوە بە پابەند بوون بە کۆمەڵی موسوڵمانەوەو یەك ڕیزییەوە،

---

[1] أحمد (١/٣٠٠)، فەرموودەیەکی لاوازە.

[2] تحفة الاحوذي (٧/٣٠٧)، النسائي في الكبرى (٦/٣١٣)، إبن ماجة (٢/١٤٤٦)، إبن حبان (٩/٢٧٨)، الحاكم (٢/٢٩٤)، لاوازە.

[3] أحمد (٣/٣١٥)، فەرموودەیەکی سەحیحە.

[4] مسلم (٤/٢٢٠٥).

[5] فتح الباري (١٣/٣٩٥)، مسلم (٤/٢٠٦١).

[6] آل عمران (١١٢).

وەك لە سەحیحی موسلیما هاتووە لە ئەبوهورەیرەوە كە پێغەمبەری خودا (ﷺ) فەرموویەتی: (خودا بە سێ شت لێتان ڕازی دەبێتو بە سێ شتیش ڕقی لێتان دەبێت، خودا لێتان ڕازی دەبێت بەوەی كە بیپەرستنو هیچ هاوبەشێكی بۆ بڕیار نەدەن. وە هەموو دەست بگرن بە بەڵێنو پەیمانی خوداوە جیا نەبنەوە. وە ئامۆژگاری ئەو كەسانە بكەن كە خودا كردوویەتی بە لێپرسراوتان، وە ڕقی لە سێ شتی ئێوەیە: وتی وتی، زۆر پرسیار كردن، بەفیڕۆدانیماڵو سامان)[1] پاشان خودای گەورە ئەفەرموێت: ﴿وَاذْكُرُوا نِعْمَتَ اللَّهِ عَلَيْكُمْ إِذْ كُنتُمْ أَعْدَاءً فَأَلَّفَ بَيْنَ قُلُوبِكُمْ فَأَصْبَحْتُم بِنِعْمَتِهِ إِخْوَانًا وَكُنتُمْ عَلَىٰ شَفَا حُفْرَةٍ مِّنَ النَّارِ فَأَنقَذَكُم مِّنْهَا ۗ كَذَٰلِكَ يُبَيِّنُ اللَّهُ لَكُمْ آيَاتِهِ لَعَلَّكُمْ تَهْتَدُونَ﴾ بیر لەو چاكەیە بكەنەوە كە خودا دەربارەی كردن: كە ئێوە دژ بەیەكتر بوون. بە دڵ كردوونی بە یەك، لە سایەی چاكەی ئەمەوە، ئێستا بوونەتە برای یەك، لەسەر لێواری ئاگر بوون، هەر ئەو بوو ڕزگاری كردن. خودا ئاوا نیشانەكانی خۆی بۆ ئێوە ڕوون دەكاتەوە، بەڵكو ڕێگا بدۆزنەوە. ئەم دەقە دەربارەی ئەوسو خەزرەج بووە. چونكە شەڕێكی زۆرو بەردەوام لە نێوانیاندا ڕوویدابوو لە چەرخی نەفامیدا. دوژمنایەتیو ڕقو كینەیەكی ئێجگار زۆر كەوتبووە نێوانیان. كە بوبوە هۆی شەڕو كوشتاری بەردەوام، كاتێ كە خودا ئیسلامی بۆ هێنان، ئەوەی ویستی موسوڵمان ببێ موسوڵمان بوو لەگەڵ یەكا بوونە برای یەكو لەبەر خودا یەكتریان خۆش دەویستو پشتی یەكتریان دەگرتو هاوكاری یەكتریان دەكرد لەسەر چاكەو لەخوا ترسی. وەك خودای گەورە لە ئایەتێكی تردا فەرموویەتی: ﴿هُوَ الَّذِي أَيَّدَكَ بِنَصْرِهِ وَبِالْمُؤْمِنِينَ ﴿٦٢﴾ وَأَلَّفَ بَيْنَ قُلُوبِهِمْ ۚ لَوْ أَنفَقْتَ مَا فِي الْأَرْضِ جَمِيعًا مَّا أَلَّفْتَ بَيْنَ قُلُوبِهِمْ﴾[2] هەر ئەویش (واتە خودا) هاتە هاواری خۆتو خاوەن باوەڕانو یارمەتی دان. بە دڵ ئەوانی كردە هاوكاری یەكتری، ئەگەر هەرچی لەسەر زەمیندا هەیە، هەمووت ببەخشیایە، نەتدەتوانی لە یەكتریان كۆ بكەیتەوە، بەڵام خودا وا لە یەكتری كۆ كردنەوە. واتە: بەهۆی خوانەناسیانەوە لەسەر كەناری چاڵی ئاگر بوون، خودا لەو ئاگرە ڕزگاری كردنو ڕێی نیشاندان بەرەو باوەڕهێنان، پێغەمبەریش (ﷺ) بەوە منەت دەكات بەسەریاندا لە ڕۆژی دابەش كردنی دەستكەوتەكاندا. چونكە هەندێكیان ناڕەزاییان دەربڕی كە ڕێزی هەندێكی (لە كۆچەریەكان) داوە بەسەر ئەواندا لە دابەش كردنی ئەو دەستكەوتەدا. پێغەمبەری خودایش (ﷺ) بە فەرمانی خودا ئەو دەستكەوتەی دابەش كردبوو، بۆیە وتارێكی بۆ دانو فەرمووی: (ئەی كۆمەڵی ئەنساریەكان، ئایا من ئێوەم نەدی كە گومڕا بوون خودا ڕێی نیشاندان بەهۆی منەوە، وە ئێوە جیاجیا نەبوون خودا بەهۆی منەوە كردنی بە یەك، هەژار نەبوون خودا بەهۆی منەوە

---

[1] مسلم (٣/١٣٤٠).

[2] الانفال (٦٢-٦٣).

دەوڵەمەندی کردن؟) هەر کە پێغەمبەر شتێکی ئەفەرموو، دەیان وت: خوداو پێغەمبەرەکەی جێی متمانەن.[1]

﴿وَلۡتَكُن مِّنكُمۡ أُمَّةٞ يَدۡعُونَ إِلَى ٱلۡخَيۡرِ وَيَأۡمُرُونَ بِٱلۡمَعۡرُوفِ وَيَنۡهَوۡنَ عَنِ ٱلۡمُنكَرِۚ وَأُوْلَٰٓئِكَ هُمُ ٱلۡمُفۡلِحُونَ ﴿١٠٤﴾ وَلَا تَكُونُواْ كَٱلَّذِينَ تَفَرَّقُواْ وَٱخۡتَلَفُواْ مِنۢ بَعۡدِ مَا جَآءَهُمُ ٱلۡبَيِّنَٰتُۚ وَأُوْلَٰٓئِكَ لَهُمۡ عَذَابٌ عَظِيمٞ ﴿١٠٥﴾ يَوۡمَ تَبۡيَضُّ وُجُوهٞ وَتَسۡوَدُّ وُجُوهٞۚ فَأَمَّا ٱلَّذِينَ ٱسۡوَدَّتۡ وُجُوهُهُمۡ أَكَفَرۡتُم بَعۡدَ إِيمَٰنِكُمۡ فَذُوقُواْ ٱلۡعَذَابَ بِمَا كُنتُمۡ تَكۡفُرُونَ ﴿١٠٦﴾ وَأَمَّا ٱلَّذِينَ ٱبۡيَضَّتۡ وُجُوهُهُمۡ فَفِي رَحۡمَةِ ٱللَّهِۖ هُمۡ فِيهَا خَٰلِدُونَ ﴿١٠٧﴾ تِلۡكَ ءَايَٰتُ ٱللَّهِ نَتۡلُوهَا عَلَيۡكَ بِٱلۡحَقِّۗ وَمَا ٱللَّهُ يُرِيدُ ظُلۡمٗا لِّلۡعَٰلَمِينَ ﴿١٠٨﴾ وَلِلَّهِ مَا فِي ٱلسَّمَٰوَٰتِ وَمَا فِي ٱلۡأَرۡضِۚ وَإِلَى ٱللَّهِ تُرۡجَعُ ٱلۡأُمُورُ ﴿١٠٩﴾﴾

**فەرماندان بە بانگەوازکردن بۆ لای خودا**

خودای گەورە ئەفەرموێت: ﴿وَلۡتَكُن مِّنكُمۡ أُمَّةٞ يَدۡعُونَ إِلَى ٱلۡخَيۡرِ وَيَأۡمُرُونَ بِٱلۡمَعۡرُوفِ وَيَنۡهَوۡنَ عَنِ ٱلۡمُنكَرِۚ وَأُوْلَٰٓئِكَ هُمُ ٱلۡمُفۡلِحُونَ﴾ دەبێ لەناو ئێوەدا کۆمەڵێك هەبێ، فەرمان بە چاکە بدەن و ڕێ لە خراپە بگرن، هەر ئەوانەش ڕزگار دەبن. زەحاك وتی: ئەوانە هاوەڵە تایبەت و گێڕەوە تایبەتەکانن واتە: موجاهیدان و زانایانن[2]. مەبەست بەم ئایەتە ئەوەیە، دەبێ کۆمەڵێ لەناو ئەم ئوممەتەدا هەبێ هەڵسێ بە فەرماندان بە چاکەو بەرگری بکات لە خراپە، هەرچەندە دەبێ هەموو کەسێ لەم ئوممەتەدا بەپێی خۆی هەڵسێ بە فەرمان کردن بە چاکەو بەرگری کردن لە خراپە. وەك لە سەحیحی موسلیما هاتووە لە ئەبوهورەیرەوە وتی: پێغەمبەری خودا (ﷺ) فەرموویەتی: هەر کەسێك لە ئێوە خراپەیەکی بینی با بە دەست بیگۆڕێت، وە ئەگەر نەیتوانی با بە زمان، وە ئەگەر نەیتوانی با بە دڵ پێی ناخۆش بێت، ئەوە لاوازترین پلەی بڕوایە، وە لە ڕیوایەتێکی تردا هاتووە: (لە دوای ئەوەوە بە ئەندازەی دەنکە خەرتەلەیە بڕوا نیە)[3] ئیمامی ئەحمەد ڕیوایەتی کردووە لە حوزەیفەی کوڕی یەمانەوە کە پێغەمبەر (ﷺ) فەرموویەتی: سوێند بەو کەسەی گیانی منی بەدەستە دەبێ فەرمان بدەی بە چاکەو بەرگری بکەن لە خراپە، یا نزیکە خودا لەلایەن خۆیەوە سزاو تۆڵەیەکتان بۆ بنێرێ، ئەوسا لێی دەپاڕێنەوە بەڵام پاڕانەوەکەتان لێ وەرناگیرێ[4]، تیرمیزیش ڕیوایەتی کردووەو وتی: فەرموودەیەکی حەسەنە.[1] ئایەت و فەرموودە لەم بارەیەوە زۆرن، بەو زوانە لە شوێنی خۆیدا دێت و ماناکەی دەکرێت.

---

[1] النسائي في الكبرى (٥/٩١).

[2] الطبري (٧/٩٢).

[3] مسلم (١/٦٩-٧٠).

[4] أحمد (٥/٣٨)، فەرموودەیەکی حەسەنی سەحیحە.

## قەدەغە کردنی جیاجیایی و بڵاوبوونەوە

خودای گەورە ئەفەرموێت: ﴿وَلَا تَكُونُوا كَالَّذِينَ تَفَرَّقُوا وَاخْتَلَفُوا مِن بَعْدِ مَا جَاءَهُمُ الْبَيِّنَاتُ ۚ وَأُولَٰئِكَ لَهُمْ عَذَابٌ عَظِيمٌ﴾ نەکا وەك ئەوانە بکەن، کە لێکتر جیا بونەوەو لە دوای ئەوەی نیشانەی ئاشکرایان بۆ هات، ئەوسا کێشەیان تێ کەوت. ئەوانە ئازارێکی گەورەیان بۆ هەیە. خودای گەورە ڕێگری کردووە لەم ئوممەتە کە وەك ئوممەتە پێشوەکان بکەن کە ناکۆکی و جیاوازی کەوتبووە نێوانیان و فەرمانیان بە چاکە نەئەداو بەرگرییان لە خراپەیش نەئەکرد لەگەڵ ئەو بەڵگانەیشا کە پێشانیان درابوو. ئیمامی ئەحمەد ڕیوایەتی کردووە لە ئەبوعامیرەوە عەبدوڵڵای کوڕی لوحەیی وتی: لەگەڵ مەعاویەی کوڕی ئەبوسوفیاندا حەجمان کرد. کاتێ کە گەیشتینە مەککە، کاتێ کە نوێژی نیوەڕۆی کرد هەڵساو وتی: پێغەمبەری خودا (ﷺ) فەرمووی: (ئەهلی هەردوو کتێبەکە لە ئاینەکەیاندا لە یەکتر جیا بونەوەو بوون بە حەفتاو دوو کۆمەڵ ئەم ئوممەتەیش بەو زوانە دەبن بە حەفتاو سێ دەستە واتە: هەموویان لەناو ئاگران یەکێکیان نەبێ، کە ئەویش کۆمەڵە، وە بەو زوانە چەند دەستەیەك لە ئوممەتی من پەیدا دەبێ ئەو هەواو ئارەزوە دەیانبات وەك چۆن سەگ لەگەڵ خاوەنەکەی دەڕوات، هیچ ڕەگو دەمارو جومگەیەك نامێنێ مەگین چوەتە ناوی) بەخوا ئەی کۆمەڵی عەرەب ئەگەر ئێوە هەڵنەسن بەوەی پێغەمبەرەکەتان (ﷺ) بۆی هێناون، خەڵکی تری جگە لە ئێوە شیاو ترە کە پێی هەڵنەسێ[2]. ئەبوداوود هەر بەم شێوەیە ڕیوایەتی کردووە ئیمامی ئەحمەدو موحەممەدی کوڕی یەحیاوە[3].

## بەرهەمی یەکێتی و جیاجیایی لە ڕۆژی قیامەتدا

خودای گەورە ئەفەرموێت: ﴿يَوْمَ تَبْيَضُّ وُجُوهٌ وَتَسْوَدُّ وُجُوهٌ﴾ لەو ڕۆژەدا هەندێ ڕوویان سپیەو هەندێکی تر ڕوویان ڕەشە. واتە لە ڕۆژی قیامەتدا ڕووی ئەهلی سونەو جەماعە ڕوویان سپیەو، ئەهلی بیدعەو جیاوازگەران ڕوویان ڕەشە، ئەمە قسەی ئیبنوعەبباسە. ﴿فَأَمَّا الَّذِينَ اسْوَدَّتْ وُجُوهُهُمْ أَكَفَرْتُم بَعْدَ إِيمَانِكُمْ﴾ ئەو کەسانەی ڕووڕەشی ڕۆژی قیامەتن، پێیان دەڵێن: ئێوە دوای بڕواهێنان چۆن بونەوە بە خوانەناس؟ حەسەنی بەسری وتی: مەبەست پێی دووڕووەکانە ﴿فَذُوقُوا الْعَذَابَ بِمَا كُنتُمْ تَكْفُرُونَ﴾ سا بەهۆی ئەو بێ باوەڕیتانەوە جەزرەبە بچێژن. ئەم وەسفە گشت خوانەناسێ دەگرێتەوە. ﴿وَأَمَّا الَّذِينَ ابْيَضَّتْ وُجُوهُهُمْ فَفِي رَحْمَةِ اللَّهِ هُمْ فِيهَا خَالِدُونَ﴾ ئەوانەش کە ڕوویان سپیە، بۆ هەمیشە

---

[1] تحفة الاحوذي (٦/٣٩٠).

[2] أحمد (٤/١٠٢)، فەرموودەیەکی سەحیحە.

[3] أبوداود (٥/٥)، سەحیحە.

بەزەیی خودایان هەیەو تا هەتایە هەر لە بەهەشتان. واتە: هەرگیز لە بەهەشت دەرناچن تێیدا دەمێننەوە. تیرمیزی ڕیوایەتی کردووە لە تەفسیری ئەم ئایەتەدا لە ئەبوغالبەوە، وتی: ئەبوئومامە چەند سەرێکی دی لەسەر ڕێگای دیمەشق هەڵواسرابوون. ئەبوئومامە وتی: ئەمانە سەگی ناو ئاگرن‌و خراپترینی کوژراون لە ژێر سایەی ئاسماندا، چاکترین کوژراویش ئەو کەسانەن کە ئەمانە کوشتویانە، پاشان ئەم ئایەتەی خوێند: ﴿ يَوْمَ تَبْيَضُّ وُجُوهٌ وَتَسْوَدُّ وُجُوهٌ ﴾ تا کۆتایی ئایەتەکە. منیش وتم بە ئەبوئومامە: تۆ ئەمەت لە پێغەمبەری خودا بیستوە؟ وتی: ئەگەر جارێ یان دوو جار یان سێ یان چوار هەتا حەوت جار گوێم لێ نەبوایە بۆم باس نەدەکردن، پاشان وتی: ئەم فەرموودەیەکی حەسەنە ئیبنوماجەو ئیمامی ئەحمەدیش هەر وا ڕیوایەتیان کردووە پاشان خودای گەورە ئەفەرموێت: ﴿ تِلْكَ ءَايَٰتُ ٱللَّهِ نَتْلُوهَا عَلَيْكَ بِٱلْحَقِّ ﴾ ئەمانە نیشانەی خودان کە ڕاستن‌و ئێمە بۆتی دەخوێنینەوە (ئەی موحەممەد (ﷺ)) ئەوانە هەموو ئاشکرا دەکەین لە دنیاو لە ڕۆژی دوایشدا. ﴿ وَمَا ٱللَّهُ يُرِيدُ ظُلْمًا لِّلْعَٰلَمِينَ ﴾ هیچ کاتێ خودا ناهەقی لە هیچ کەس ناکات. بەڵکو خودا فەرمانڕەوایەکی دادپەروەرەو زۆرو ستەم لە کەس ناکات، چونکە خودا دەستەڵاتی بەسەر هەموو شتێکا هەیەو ئاگاداری گشت شتێکەو پێویستی بەوە نیە ناهەقی بە هیچ کەسێ نیە لە دروستکراوێکی بکات. هەر بۆیە ئەفەرموێت: ﴿ وَلِلَّهِ مَا فِي ٱلسَّمَٰوَٰتِ وَمَا فِي ٱلْأَرْضِ ۚ وَإِلَى ٱللَّهِ تُرْجَعُ ٱلْأُمُورُ ﴾ هەرچی لە ئاسمانەکان‌و زەمیندایە، هەموو کارەکان هەر بۆ لای خودا دەگەڕێتەوە. واتە: هەموو بەندەو موڵکی ئەوەو هەر خودا خۆی کاربەدەست‌و فەرمانڕەوایە لە دنیاو لە ڕۆژی دوایدا.

﴿ كُنتُمْ خَيْرَ أُمَّةٍ أُخْرِجَتْ لِلنَّاسِ تَأْمُرُونَ بِٱلْمَعْرُوفِ وَتَنْهَوْنَ عَنِ ٱلْمُنكَرِ وَتُؤْمِنُونَ بِٱللَّهِ ۗ وَلَوْ ءَامَنَ أَهْلُ ٱلْكِتَٰبِ لَكَانَ خَيْرًا لَّهُم ۚ مِّنْهُمُ ٱلْمُؤْمِنُونَ وَأَكْثَرُهُمُ ٱلْفَٰسِقُونَ ﴿١١٠﴾ لَن يَضُرُّوكُمْ إِلَّآ أَذًى ۖ وَإِن يُقَٰتِلُوكُمْ يُوَلُّوكُمُ ٱلْأَدْبَارَ ثُمَّ لَا يُنصَرُونَ ﴿١١١﴾ ضُرِبَتْ عَلَيْهِمُ ٱلذِّلَّةُ أَيْنَ مَا ثُقِفُوٓا۟ إِلَّا بِحَبْلٍ مِّنَ ٱللَّهِ وَحَبْلٍ مِّنَ ٱلنَّاسِ وَبَآءُو بِغَضَبٍ مِّنَ ٱللَّهِ وَضُرِبَتْ عَلَيْهِمُ ٱلْمَسْكَنَةُ ۚ ذَٰلِكَ بِأَنَّهُمْ كَانُوا۟ يَكْفُرُونَ بِـَٔايَٰتِ ٱللَّهِ وَيَقْتُلُونَ ٱلْأَنۢبِيَآءَ بِغَيْرِ حَقٍّ ۚ ذَٰلِكَ بِمَا عَصَوا۟ وَّكَانُوا۟ يَعْتَدُونَ ﴿١١٢﴾ ﴾

**ڕێزی ئوممەتی پێغەمبەرو (ﷺ) هەڵبژاردنی بە چاکترین ئوممەت لەناو خەڵکی دنیادا**

خودای گەورە باسی ئەم ئوممەتەی پێغەمبەر دەکات (ﷺ) کە چاکترین ئوممەتەو ئەفەرموێت: ﴿ كُنتُمْ خَيْرَ أُمَّةٍ أُخْرِجَتْ لِلنَّاسِ ﴾ ئێوە چاکترین کۆمەڵن لەناو خەڵکی دنیادا سەرتان هەڵداوە. بوخاری ڕیوایەتی کردووە لە ئەبوهورەیرەوە (ڕەزای خوای لێ بێت) لەم دەقەدا کە خودای گەورە

ئەفەرموێت: ﴿كُنتُمۡ خَيۡرَ أُمَّةٍ أُخۡرِجَتۡ لِلنَّاسِ﴾ وتی: چاكترین كەسن بۆ خەڵكی. دەیانهێنن كۆتو زنجیر لە ملیاندایە هەتا بچنە ناو ئیسلامەوە ئیبنوعەبباسو موجاهیدو عەتیەی عەوفیو عیكرمەو عەتاو ڕەبیعی كوڕی ئەنەسیش هەر وایان وتوە. واتە: چاكترین كەسن بۆ خەڵكی واتە: ئوممەتی ئیسلام چاكترینو بە سودترین كەسن بۆ خەڵكی، هەر بۆیە خودای گەورە ئەفەرموێت: ﴿تَأۡمُرُونَ بِٱلۡمَعۡرُوفِ وَتَنۡهَوۡنَ عَنِ ٱلۡمُنكَرِ وَتُؤۡمِنُونَ بِٱللَّهِ﴾ فەرمان بە چاكە ئەدەنو ڕێگری لە خراپە دەكەن، باوەڕیشتان بە خودا هەیە. ولە موسنەدی ئیمامی ئەحمەدو سونەنی ئیبنوماجەو موستەدرەكی حاكیم لە ڕیوایەتی حەكیمی كوڕی مەعاویەی كوڕی حەیدەوە لە باوكیەوە وتی: پێغەمبەری خودا (ﷺ) فەرمووی: ئێوە دەبنە تەواوكەری حەفتا ئوممەت، وە ئێوە چاكترینیانن، وە ئێوە بەڕێزترن لە لای خودای گەورە[1]. ئەم فەرموودە بەناوبانگە تیرمیزی بە حەسەنی داناوە. وە ڕیوایەت كراوە لە فەرموودەكەی مەعازی كوڕی جەبەلو ئەبوسەعیدەوە بەم شێوەیە. بێگومان ئوممەتە بەشی زۆریان هەیە لە خێرو بێرا بەهۆی پێغەمبەرەوە موحەممەد (ﷺ) كە بەڕێزو بە قەدرترین دروستكراوی خودایەو بەڕێزترین پێغەمبەریشە، خودای گەورە بە پەیامێكی تێرو تەواو گەورەدا ڕەوانەی كردووە. كە بە هیچ پێغەمبەرێكی تری نەداوە. هەڵسان بە كاركردن لەسەر ڕێبازو پەیرەوی ئەم ئاینە با كەمیش بێ، كارە ڕێبازەكانی تر با زۆریش بێ جێگای ناگرێتەوە. وەك ئیمامی ئەحمەد ڕیوایەتی كردووە لە عەلی كوڕی ئەبوتالیبەوە (ڕەزای خوای لێ بێت) وتی: پێغەمبەری خودا (ﷺ) فەرموویەتی: (خەڵات كراوم بە شتێ هیچ كام لە پێغەمبەران ئەو خەڵاتەی پێ نەدراوە) وتمان ئەی پێغەمبەری خودا (ﷺ) ئەو شتەچیە؟ فەرمووی: (بە ترس خستنە دڵی دوژمنانمەوە یارمەتی دراوم، كلیلەكانی زەویم پێدراوە، ناوی ئەحمەد لێنراوە، خۆڵم بۆ كراوەتە پاككەرەوە، ئوممەتەكەیشم بە چاكترینی ئوممەتەكان دانراوە)[2]. سەنەدەكانی حەسەنە. فەرموودە زۆر هاتووە لەم بارەیەوە. هەندێكی دەشێت لێرەدا باس بكرێ. لە هەردوو سەحیحەكەدا هاتووە لە سەعیدی كوڕی موسەییەوە كە ئەبوهورەیرە بۆی باس كردەوەو وتویەتی: بیستم لە پێغەمبەری خودا (ﷺ) ئەیفەرموو: (كۆمەڵێ لە ئوممەتی من دەچنە بەهەشت كە ئەوانە حەفتا هەزارن ڕوویان ئەدرەوشێتەوە وەك درەوشانەوەی مانگ لە شەوی چواردەدا) ئەبوهورەیرە وتی: عوكاشەی كوڕی میحسەنی ئەسەدی هەڵساو پۆشاكێكی بەسەرەوەبوو بەرزی كردووە، وتی: ئەی پێغەمبەری خودا (ﷺ) داوام بۆ بكە لە خودا كە یەكێك بم لەوانە) پێغەمبەری خودا (ﷺ) فەرمووی: (ئەی خودایە بیكە بە یەكێ لەوانە)، پاشان پیاوێكی

---

[1] أحمد (٣/٥)، تحفة الاحوذي (٣٥٢/٨)، إبن ماجة (١٤٣٣/٢)، فەرموودەیەكی سەحیحە.

[2] أحمد (٩٨/١)، فەرموودەیەكی حەسەنە.

ئەنساری هەڵساو وتی: ئەی پێغەمبەری خـودا (ﷺ) داوا بکە لـە خـودا کـە منـیش یـەکێك بم لەوانـە. فەرمووی: (عوکاشە لەوا پێش کەوت)[1].

**جۆرێکی تر لەو فەرمودانەی کە نیشانەن لەسەر چاکی ئەم ئوممەتەو رێزو حورمەتی لەلای خودای گەورە، وە چاکترینی ئوممەتە لە دنیاو قیامەتدا**

ئیمامی ئەحمەد ریوایەتی کردووە لە جابیرەوە لـە پێغەمبـەر (ﷺ) ئەیفـەرموو: (مـن هیـوام وایـە لەوانەی کە شوێنم دەکەون لە ئوممەتەکـەم لـە رۆژی قیامەتـدا چـواریەکی بەهەشـت بن)، ووتـی: (الله أکبر) مانکرد، پاشان فەرمووی: (هیوام وایە کە سێیەکی خەڵك بن)، وتـی: (الله أکبر) مـانکرد، پاشـان فەرمووی: (هیوام وایە نیوەی بن)[2] وە هەر بەو شێوەیە لە رێگایـەکی تریـشەوە ریوایـەت کـراوە[3]. ئـەم فـەرموودە لەسـەر مـەرجی موسـلیمە. وە لـە هـەردوو سـەحیحەکەدا هـاتووە لـە عەبـدوڵڵای کـوڕی مەسعودەوە، وتی: پێغەمبەری خودا (ﷺ) پێی وتین: (ئایا رازی نابن کە چـواریەکی ئـەهلی بەهەشـت بن؟)، (الله أکبر) مانکرد، پاشان فەرمووی: (ئایا رازی نابن سێیەکی ئـەهلی بەهەشـت بن؟ (الله أکـبر) مانکرد پاشان فەرمووی: (من هیوام وایە کە نیوەی ئەهلی بەهەشت بن)[4].

**فەرموودەیەکی تر**

ئیمامی ئەحمەد ریوایەتی کردووە لە بورەیدەوە کە پێغەمبەری خـودا(ﷺ) فەرموویـەتی: (ئـەهلی بەهەشت سەدو بیست ریزن، ئەم ئوممەتە هەشتا ریزن لەو ریزانەدا)[5]، هەر بەو شـێوەیە لـە رێگایـەکی تریشەوە ریوایەت کراوە[6] تیرمیزی ریوایەتی کردووە، وتی: ئەم فـەرموودە، فەرموودەیـەکی حەسـەنە[7] ئیبنوماجەیش ریوایەتی کردووە[8] عەبدورەزاق ریوایەتی کردووە لـە ئـەبوهورەیرەوە (ڕەزای خـوای لـێ بێت) کە پێغەمبەر (ﷺ) فەرموویەتی: (ئێمە دواینەکانین (لە دنیاو) یەکەمـەکانین لـە رۆژی قیامەتـدا، ئێمە یەکەم کەسین دەچینە بەهەشت، ئەگەرچی ئەوان لە پێش ئێمەدا کتێبیان بۆ هاتووە، ئێمـە دوای ئەوان بۆمان هاتووە، خودا ئێمەی شارەزا کرد لەوەی ئەوان تێیدا نـاکۆك بـوون لـەو هەقـە، ئەمـە ئـەو رۆژەیە ئەوان تێیدا ناکۆك بوو، خەڵکی لەمەدا شوێنی ئێمە کەوتن. سبەینێ بۆ جوولەکەو دووسبەی بۆ

---

[1] فتح الباري (٤١٢/١١)، مسلم (١٩٧/١).

[2] أحمد (٣٤٦/٣)، فەرموودەیەکی سەحیحە.

[3] أحمد (٣٨٣/٣)، سەحیحە.

[4] فتح الباري (٣٨٥/١١)، مسلم (٢٠٠/١).

[5] أحمد (٣٥٥/٥)، فەرموودەیەکی حەسەنە.

[6] أحمد (٣٤٧/٥)، حەسەنە.

[7] تحفة الاحوذي (٢٥٦/٧)، حەسەنە.

[8] إبن ماجة (١٣٤/٢)، حەسەنە.

مەسیحیەکان (مەبەست بەو ڕۆژە، ڕۆژی هەینیە))، بوخاریو موسلیم بە مەرفوعی ڕیوایەتیان کردووە هەر بەم شێوەیە[1]، دیسان موسلیم ڕیوایەتی کردووە لە ئەبوهورەیرەوە، وتی: پێغەمبەری خودا (ﷺ) فەرموویەتی: (ئێمە دواینو یەکەمین لە ڕۆژی قیامەتدا، وە ئێمە یەکەمین کەسین دەچێتە بەهەشت)[2] ئەم فەرموودانەو چەندین فەرموودەی تریش هەر ئەم مانایە دەبەخشێ کە خودای گەورە ئەفەرموێت: ﴿كُنتُمْ خَيْرَ أُمَّةٍ أُخْرِجَتْ لِلنَّاسِ تَأْمُرُونَ بِالْمَعْرُوفِ وَتَنْهَوْنَ عَنِ الْمُنكَرِ وَتُؤْمِنُونَ بِاللَّهِ﴾ هەرکەسێ ئەم ڕەوشتانەی تێدابوو ئەم ڕێزلێنانە دەیگرێتەوە. وەك قەتادە دەڵێ: بۆیان گێڕاوینەتەوە کە عومەری کوڕی خەتاب حەجی دەکرد، بینی هەندێ لە خەڵکی پەلەیان بوو، ئەم ئایەتەی خوێند: ﴿كُنتُمْ خَيْرَ أُمَّةٍ أُخْرِجَتْ لِلنَّاسِ﴾ پاشان وتی: هەرکەسێ پێی خۆشە لەم ئوممەتە بێ، با مەرجی خودای تیا بەجێ بێنێ.[3] ئیبنوجەریر ڕیوایەتی کردووە، هەرکەسیش ئەم ڕەوشتانەی تیا نەبوو، ئەوە لەو ئەهلی کتێبانە دەچێ کە خودای گەورە باسی خراپی کردوونو ئەفەرموێت: ﴿كَانُوا لَا يَتَنَاهَوْنَ عَن مُّنكَرٍ فَعَلُوهُ﴾[4] لەو ڕەفتارە نالەبارەی وا دەیانکرد، بەرگریان لە یەك نەکرد. هەر بۆیە خودای گەورە کاتێ وەسفی ئەم ئوممەتە دەکات لەسەر ئەوە کە فەرمان ئەدەن بە چاکەو بەرگری دەکەن لە خراپە، دێتە سەر باسی خراپی ئەهلی کتێبو سەرزەنشتیان دەکاتو ئەفەرموێت: ﴿وَلَوْ آمَنَ أَهْلُ الْكِتَابِ لَكَانَ خَيْرًا لَّهُم ۚ مِّنْهُمُ الْمُؤْمِنُونَ وَأَكْثَرُهُمُ الْفَاسِقُونَ﴾ خۆ ئەگەر ئەهلی کتێبیش بڕوایان بهێنایە، بۆیان چاکتر بوو، ئەوانیش هی وایان تێدایە کە بڕوادارن، بەشی زۆریشیان لە ڕێی خودا لایانداوە. واتە: ژمارەیەکی کەمیان بڕوایان هەیە بە خوداو ئەوەی بۆ ئێوە هاتوەو ئەویش بۆ خۆیان هاتووە. زۆریەیان لەسەر ڕێی گومڕاییو خوانەناسینو یاخیو لە ڕێگە دەرچوون.

### مزگێنی دان بە موسوڵمانان بە یارمەتی دانو سەرکەوتن بەسەر ئەهلی کتێبدا

پاشان خودای گەورە باسی عەبدە خاوەن باوەڕەکانی دەکات مژدەی سەرکەوتنو زاڵ بونیان پێدەدات بەسەر ئەو ئەهلی کتێبە خوانەناسو بێ دینانەو ئەفەرموێت: ﴿لَن يَضُرُّوكُمْ إِلَّا أَذًى ۖ وَإِن يُقَاتِلُوكُمْ يُوَلُّوكُمُ الْأَدْبَارَ ثُمَّ لَا يُنصَرُونَ﴾ ئەوانیش هەرگیز ناتوانن زیانتان پێ بگەیەنن، ئەگەر

---

[1] البخاري (٨٩٦/٣٤٨٦/٣٤٨٧)، مسلم (٨٥٥).

[2] مسلم (٨٨٥).

[3] الطبري (١٠٢/٧).

[4] المائدة (٧٩).

شەڕیشتان لەگەڵا بکەن، زۆر زوو پشتتان تێدەکەن و ڕادەکەن و کەسیش بە هانایانەوە نایەت. هەر وایش بوو، لە ڕۆژی خەیبەرا خودا زەلیل و ڕسوای کردن و لوتی شکاندن، هەروەها لە پێشیانەوە جوولەکەکانی مەدینە وە بەنی قەینوقاع و بەنی نەزیرو بەنی قورەیزە هەموویان خودا زەلیلی کردن. وە مەسیحیەکانی شامیش هەر بەو شێوەیە هاوەڵەکانی پێغەمبەر (ﷺ) تێك و پێکیان شکاندن لە زۆر شوێندا، موڵك و دەستەڵاتی شامیان بە هەتا هەتایی لێ سەندن بەردەوام هەر تیا دەمێننەوە هەتا ئەو ڕۆژەی عیسای کوڕی مەریەم (سەلامی خوای لێ بێت) دادەبەزێ هەر لەوێ دەبن. بەو پەیامەی موحەممەد (ﷺ) هێناویەتی فەرمانڕەوایە دەکات. خاچ دەشکێنێ و بەراز دەکوژێ و سەرانە دادەنێ و جگە لە ئیسلام هیچ شتێکی تر قبووڵ ناکات. پاشان خودای گەورە ئەفەرموێت: ﴿ضُرِبَتْ عَلَيْهِمُ الذِّلَّةُ أَيْنَ مَا ثُقِفُوٓا إِلَّا بِحَبْلٍ مِّنَ اللَّهِ وَحَبْلٍ مِّنَ النَّاسِ﴾ لە هەر جێش بن، هەر ژێر چەپۆکی و زەبوونی بەشیانە. جا مەگین هەر پەیمان لەگەڵ خوداو خەڵکا بگاتە فریایان. واتە: خودا سەرشۆڕی و زەلیلی کردۆتە بەشیان، لە هەرکوێ بن، چونکە باوەڕ ناهێنن. هیچ دەرفەتێکیان نیە مەگەر پەیمان بدەن بە خواو بەو خەڵکەو سەرانە بدەن و بڕیاری ئەهلی زیممە بدرێ بەسەریاندا. وەك چۆن لە کاتی شەڕ وەستان و پەیمان بەستن و بەدیل گیراندا، کاتێ کە موسوڵمانێ پەنای ئەدا، با ئەو کەسە ئافرەتیش بێ. پابەندە لەسەر ڕایە لە ڕایەکانی زانایان. ئیبنوعەبباس وتی: ﴿إِلَّا بِحَبْلٍ مِّنَ اللَّهِ وَحَبْلٍ مِّنَ النَّاسِ﴾ واتە: بە پەیمانێ لە لایەن خوداوە یان بە پەیمانێ لەلایەن خەڵکەوە[1]. موجاهیدو عیکرمەو عەتاو زەحاك و حەسەن و قەتادەو سوودی و ڕەبیعی کوڕی ئەنەسیش هەروایان وتوە[2] پاشان خودای گەورە ئەفەرموێت: ﴿وَبَآءُو بِغَضَبٍ مِّنَ اللَّهِ وَضُرِبَتْ عَلَيْهِمُ الْمَسْكَنَةُ﴾ تووشی تووڕەیی خودا بوون و مۆری زەبوونی نراوە بەسەریانا، چونکە شایەنی بوون. بۆیە خودای گەورە ئەفەرموێت: ﴿ذَٰلِكَ بِأَنَّهُمْ كَانُوا يَكْفُرُونَ بِآيَاتِ اللَّهِ وَيَقْتُلُونَ الْأَنبِيَآءَ بِغَيْرِ حَقٍّ﴾ لەبەر ئەوە کە بڕوایان بە نیشانەکانی خودا نەبوو پێغەمبەرانیشیان بە ناهەق دەکوشت، هەر حەسوودی و خۆ بەزل زانی و سەرکەشیان بوو پاڵی پێوەدەنان هەڵسن بەو کارانە، خودایش تووشی ئەو زەبوونی و ڕسوایەی کردن و مۆری زەبوونی هەتا هەتایی نا بەسەریانا لە دنیاو لە قیامەتدا ﴿ذَٰلِكَ بِمَا عَصَوا وَّكَانُوا يَعْتَدُونَ﴾ بەهۆی ئەو نافەرمانی و دەست درێژیەی کە دەیانکرد. واتە: ئەو لاساری و یاخی بوونەیان پاڵی پێوەدەنان کە بڕوا نەهێنن بە

---

[1] الطبري (٧/١١٢).

[2] إبن أبي حاتم (٢/٤٨٠–٤٨١).

نیشانەکانی خوداو کوشتنی پێغەمبەرەکانو ڕۆچوون لە تاوانو خراپەکاریو سەرپێچی لە فەرمانەکانی خودا. خودای گەورە لاماندا لەوانە. هەر خودا جێی هاناو پەنایە.

﴿لَيْسُوا سَوَآءً مِّنْ أَهْلِ ٱلْكِتَٰبِ أُمَّةٌ قَآئِمَةٌ يَتْلُونَ ءَايَٰتِ ٱللَّهِ ءَانَآءَ ٱلَّيْلِ وَهُمْ يَسْجُدُونَ ﴿١١٣﴾ يُؤْمِنُونَ بِٱللَّهِ وَٱلْيَوْمِ ٱلْءَاخِرِ وَيَأْمُرُونَ بِٱلْمَعْرُوفِ وَيَنْهَوْنَ عَنِ ٱلْمُنكَرِ وَيُسَٰرِعُونَ فِى ٱلْخَيْرَٰتِ وَأُو۟لَٰٓئِكَ مِنَ ٱلصَّٰلِحِينَ ﴿١١٤﴾ وَمَا يَفْعَلُوا۟ مِنْ خَيْرٍ فَلَن يُكْفَرُوهُ وَٱللَّهُ عَلِيمٌۢ بِٱلْمُتَّقِينَ ﴿١١٥﴾ إِنَّ ٱلَّذِينَ كَفَرُوا۟ لَن تُغْنِىَ عَنْهُمْ أَمْوَٰلُهُمْ وَلَآ أَوْلَٰدُهُم مِّنَ ٱللَّهِ شَيْـًٔا وَأُو۟لَٰٓئِكَ أَصْحَٰبُ ٱلنَّارِ هُمْ فِيهَا خَٰلِدُونَ ﴿١١٦﴾ مَثَلُ مَا يُنفِقُونَ فِى هَٰذِهِ ٱلْحَيَوٰةِ ٱلدُّنْيَا كَمَثَلِ رِيحٍ فِيهَا صِرٌّ أَصَابَتْ حَرْثَ قَوْمٍ ظَلَمُوٓا۟ أَنفُسَهُمْ فَأَهْلَكَتْهُ وَمَا ظَلَمَهُمُ ٱللَّهُ وَلَٰكِنْ أَنفُسَهُمْ يَظْلِمُونَ ﴿١١٧﴾﴾

**ڕێزی ئەوانەی موسوڵمان بوون لە ئەهلی کتێب**

خودای گەورە ئەفەرموێت: ﴿لَيْسُوا سَوَآءً مِّنْ أَهْلِ ٱلْكِتَٰبِ أُمَّةٌ قَآئِمَةٌ يَتْلُونَ ءَايَٰتِ ٱللَّهِ ءَانَآءَ ٱلَّيْلِ وَهُمْ يَسْجُدُونَ﴾ ئەهلی کتێب گشت وەك یەك نین، کۆمەڵی وایان تێدیە کە ڕوو بە خودا دەوەستنو بە شەوا ئایەتەکانی خودا دەخوێننەوەو سەر دەخەنە سەر سوژدەوە. موحەممەدی کوڕی ئیسحاقو کەسانی تریش وتویانەو عەوفیش ڕیوایەتی کردووە لە ئیبنوعەبباسەوە: کە ئەم ئایەتانە لەسەر ئەو زانایانەی ئەهلی کتێب هاتۆتە خوارەوە، وەك عەبدوڵڵای کوڕی سەلامو ئوسەیدی کوڕی عوبەیدو سەعلەبەی کوڕی سەعیدو ئوسەیدی کوڕی سەعیەو کەسانی تریش لە ئەهلی کتێب. واتە: ئەوانە لە پێشەوە باسی خراپیان کرا لە ئەهلی کتێب وەك یەك نین لەگەڵ ئەمانەدا کە موسوڵمان بوون وەك خوای گەورە ئەفەرموێت: ﴿لَيْسُوا سَوَآءً﴾[1]. واتە: ئەهلی کتێب هەموو وەك یەك نین بەڵکو هەیانە موسوڵمانەو هەشیانە تاوانبارو خوانەناسە. هەر بۆیە خودای گەورە ئەفەرموێت: ﴿مِّنْ أَهْلِ ٱلْكِتَٰبِ أُمَّةٌ قَآئِمَةٌ﴾ واتە: کۆمەڵێ لەناو ئەهلی کتێبدا هەیە فەرمانی خودا بەجێ دێننو ملکەچی پەیامی خودانو شوێنی پێغەمبەری خودا دەکەون (ﷺ) لەسەر ڕاستەڕێن. ﴿يَتْلُونَ ءَايَٰتِ ٱللَّهِ ءَانَآءَ ٱلَّيْلِ وَهُمْ يَسْجُدُونَ﴾ ئایەتەکانی خومدا لە شەوا دەخوێننەوەو سەر دەخەنە سەر سوژدە. واتە: شەونوێژ دەکەنو لە نوێژەکانیاندا قورئان دەخوێنن. ﴿يُؤْمِنُونَ بِٱللَّهِ وَٱلْيَوْمِ ٱلْءَاخِرِ وَيَأْمُرُونَ بِٱلْمَعْرُوفِ

[1] المحرر الوجيز (٤٩٢/١).

﴿وَيَنْهَوْنَ عَنِ ٱلْمُنكَرِ وَيُسَٰرِعُونَ فِى ٱلْخَيْرَٰتِ وَأُو۟لَٰٓئِكَ مِنَ ٱلصَّٰلِحِينَ﴾ بڕوایـان هەیـە بـە خـوداو ڕۆژی قیامەتو فەرمان بە چاکە ئەدەنو ڕێگە لـە خراپـە دەگرنو بۆ خێـر کردن پەلـە دەکـەن، ئەوانـە لـە پیاوچاکانن. ئامانە لە کۆتایی سورەتەکەدا باسیان کراوە وەك خـودای گـەورە ئەفـەرموێت: ﴿وَإِنَّ مِنْ أَهْلِ ٱلْكِتَٰبِ لَمَن يُؤْمِنُ بِٱللَّهِ وَمَآ أُنزِلَ إِلَيْكُمْ وَمَآ أُنزِلَ إِلَيْهِمْ خَٰشِعِينَ لِلَّهِ﴾[1] لەناو ئەهلی کتێبیش کەسانی وا هەن کە بڕوای بە خودا هەیەو بەو قورئانەی کە بۆ ئێوە هاتـە خـوارو بـەو کتێبـەی کـە بۆ خۆیان هاتووە. ملکەچن بەرانبەر بە خـودا. هـەر بـەم شـێوەیە خـودای گـەورە لێرەیشدا ئەفـەرموێت: ﴿وَمَا يَفْعَلُوا۟ مِنْ خَيْرٍ فَلَن يُكْفَرُوهُ ۗ وَٱللَّهُ عَلِيمٌۢ بِٱلْمُتَّقِينَ﴾ هەر کارێکی چاك دەکەن، بـێ بـەهرە نامێنێتەوە، خودا ئەوانەی لێی دەترسن، باش دەناسـێ. واتـە: هـەرکارێکی چـاك دەکـەن لـەلای خـودا نافەوتێو پاداشتی زۆر چاکیان ئەداتەوەو کاری هیچ کەسی لێ ون نابێو بۆی هەڵدەگرێ. پاشان دێتە سەر باسی بت پەرستو خوانەناسەکانو ئەفـەرموێت: ﴿إِنَّ ٱلَّذِينَ كَفَرُوا۟ لَن تُغْنِىَ عَنْهُمْ أَمْوَٰلُهُمْ وَلَآ أَوْلَٰدُهُم مِّنَ ٱللَّهِ شَيْـًٔا ۖ وَأُو۟لَٰٓئِكَ أَصْحَٰبُ ٱلنَّارِ ۚ هُمْ فِيهَا خَٰلِدُونَ﴾ ئەوانەی خوانەناسن، داراییوماڵو منداڵیان هیچ دەردێکیان دەرمان ناکاتو لەلای خودا بەهرە نادات. جێگەیان هەر جەهەنەمو تامەتایە هەر لـەوێ دەبن. سزاو تۆڵەی خودایان لێ دوور ناخاتەوە ئەگەر بیەوێ سزایان بدات.

### باسی وێنەی ئەو شتەی خوانەناسان دەیبەخشن

موجاهیـدو حەسـەنو سـوودی دەڵـێن: پاشـان خـودای گـەورە نمونەیـەکی هێناوەتـەوە بـۆ ئـەو خوانەناسانەی کە ماڵ دەبەخشن لە ژیانی دنیادا[2] خودای گـەورە ئەفـەرموێت: ﴿مَثَلُ مَا يُنفِقُونَ فِى هَٰذِهِ ٱلْحَيَوٰةِ ٱلدُّنْيَا كَمَثَلِ رِيحٍ فِيهَا صِرٌّ﴾ هەرچی ئەوان لە ژیانی دنیادا لە ماڵی خۆیان دەیبەخـشن وێنـەی بایەکە پڕ لە سەرماو سۆڵ بێ. ئیبنوعەبباسو عیکرمەو سەعیدی کوڕی جوبـەیرو حەسـەنو قـەتادەو زەحاكو ڕەبیعی کوڕی ئەنەسو کەسانی تـریش دەڵـێن: سەرماوسۆڵەی تونـد[3]. عـەتا وتـی: سـەرماو سەهۆڵ[4] موجاهیدو ئیبنوعەبباس دیسان وتویانـە: ﴿فِيهَا صِرٌّ﴾ واتـە: ئـاگری تیایـە[5] چونکە سـەرمای بـەهێزو تونـد بەتایبـەت تـەرزەو بەسـتەڵەك بـەروبومو کـشتوکاڵ دەسـوتێنێ، وەك چـۆن ئـاگر شت

---

[1] آل عمران (١٩٩).
[2] إبن أبي حاتم (٢/٤٩٣).
[3] إبن أبي حاتم (٢/٤٩٤-٤٩٥).
[4] إبن أبي حاتم (٢/٤٩٦).
[5] إبن أبي حاتم (٢/٤٩٥).

دەسوتێنێ. ﴿أَصَابَتْ حَرْثَ قَوْمٍ ظَلَمُوٓا۟ أَنفُسَهُمْ فَأَهْلَكَتْهُ﴾ بدات لە کشتوکاڵی کۆمەڵێ ناهەقی لە خۆیان دەکەن لەناوی بەرێت. واتە: بیسوتێنێ. مەبەست پێی ئەو سەرمایە کە ئەدات لە کشتوکاڵێ کە خەریکە پێدەگاتو دان پڕ دەکاتەوەو کاتی دروێنەی دێت، هەڵێ دەپروزێنێو ئەو بەروبوم کشتوکاڵە خراپ دەکاتو بێ کەڵك دەبێ. هەر بەو شێوەیە خودای گەورە پاداشتی کردارەکانی خوانەناس دەسوتێنێو لەناوی دەبات لەم دنیادا، وەك چۆن بەروبومی کێڵگەی ئەو کەسەی لەناو برد بەهۆی گوناهی خاوەنەکەیەوە. چونکە ئەو کارانە لەسەر بێ دینیو خوانەناسی بووە. ﴿وَمَا ظَلَمَهُمُ ٱللَّهُ وَلَٰكِنْ أَنفُسَهُمْ يَظْلِمُونَ﴾ خودا ناهەقی لێ نەکردوون، بەڵام ئەوان ناهەقی لە خۆیان دەکەن.

﴿ يَٰٓأَيُّهَا ٱلَّذِينَ ءَامَنُوا۟ لَا تَتَّخِذُوا۟ بِطَانَةً مِّن دُونِكُمْ لَا يَأْلُونَكُمْ خَبَالًا وَدُّوا۟ مَا عَنِتُّمْ قَدْ بَدَتِ ٱلْبَغْضَآءُ مِنْ أَفْوَٰهِهِمْ وَمَا تُخْفِى صُدُورُهُمْ أَكْبَرُ ۚ قَدْ بَيَّنَّا لَكُمُ ٱلْءَايَٰتِ ۖ إِن كُنتُمْ تَعْقِلُونَ ﴿١١٨﴾ هَٰٓأَنتُمْ أُو۟لَآءِ تُحِبُّونَهُمْ وَلَا يُحِبُّونَكُمْ وَتُؤْمِنُونَ بِٱلْكِتَٰبِ كُلِّهِۦ وَإِذَا لَقُوكُمْ قَالُوٓا۟ ءَامَنَّا وَإِذَا خَلَوْا۟ عَضُّوا۟ عَلَيْكُمُ ٱلْأَنَامِلَ مِنَ ٱلْغَيْظِ ۚ قُلْ مُوتُوا۟ بِغَيْظِكُمْ ۗ إِنَّ ٱللَّهَ عَلِيمٌۢ بِذَاتِ ٱلصُّدُورِ ﴿١١٩﴾ إِن تَمْسَسْكُمْ حَسَنَةٌ تَسُؤْهُمْ وَإِن تُصِبْكُمْ سَيِّئَةٌ يَفْرَحُوا۟ بِهَا ۖ وَإِن تَصْبِرُوا۟ وَتَتَّقُوا۟ لَا يَضُرُّكُمْ كَيْدُهُمْ شَيْـًٔا ۗ إِنَّ ٱللَّهَ بِمَا يَعْمَلُونَ مُحِيطٌ ﴿١٢٠﴾﴾

**ڕێگری لە دۆستایەتی کردنی کەسانێ کە بڕوادار نین**

خودای گەورە ئەفەرموێت: ﴿يَٰٓأَيُّهَا ٱلَّذِينَ ءَامَنُوا۟ لَا تَتَّخِذُوا۟ بِطَانَةً مِّن دُونِكُمْ لَا يَأْلُونَكُمْ خَبَالًا وَدُّوا۟ مَا عَنِتُّمْ﴾ ئەی کۆمەڵی خاوەن باوەڕان، جگە خۆتان لەگەڵ کەسدا مەبنە دۆست، ئەوانە لە بشێوی نانەوە لە نێوانتاندا درێغی ناکەن، هە حەز دەکەن تووشی ناڕەحەتیتان کەن. خودای گەورە ڕێگری دەکات لە عەبدە خاوەن باوەڕەکانی کە دووڕووەکان بکەنە هامرازی خۆیانو لە نهێنیەکانی خۆیان ئاگاداریان بکەنو ئەوەی لە دڵیاندایە دەربارەی دوژمنەکانیان لەلای دووڕووەکان بیڵێن، چونکە ئەو دووڕووانە هەمیشە هەوڵ ئەدەنو تێدەکۆشن کە کێشەو ئاژاوە بنێنەوەو موسوڵمان تووشی ئازارو ناڕەحەتی بکەن، بە هەر فڕوفێڵێ بۆیان بکرێو حەز لە ئازاری موسوڵمانان دەکەن. خودای گەورە ئەفەرموێت: ﴿قَدْ بَدَتِ ٱلْبَغْضَآءُ مِنْ أَفْوَٰهِهِمْ وَمَا تُخْفِى صُدُورُهُمْ أَكْبَرُ﴾ واتە: بێجگە لە خۆتان کەسی تر لە ئاینەکانی تر مەکەنە دۆستی خۆتان دۆستی پیاو ئەو کەسە دڵسۆزەیە لە کەسو کاری خۆی کە لە ڕازو نیازی خۆی ئاگاداری دەکات. بوخاریو نەسائیو کەسانی تریش ڕیوایەتیان کردووە لە ئەبوسەعیدەوە کە پێغەمبەری خودا (ﷺ) فەرموویەتی: (خودای گەورە هیچ پێغەمبەرێکی نەناردوە، وە هیچ جێنشینێکی دانەناوە مەگین دوو هامرازی هەبوە، هامرازێکیان فەرمانی پێداوە بە چاکەو هانی

داوە لەسەری، هامڕازەکەی تر فەرمانی پێکردووە بە خراپەو هەڵیشی ناوە لەسەری، پارێزراویش کەسێکە خودا پارازتبێتی)[1]، ئیبنوئەبی حاتەم ڕیوایەتی کردووە لە ئیبنوئەبی دەهقانەوە وتی: وترا بە عومەری کوڕی خەتاب (ڕەزای خوای لێ بێت) لەوێدا لاوێکی خەڵکی حیرە هەیە شارەزاو نووسەرە، بۆچی ناکەیتە نووسەر؟ وتی: ئەگەر بیکەم، ئەو کاتە من هامڕازێکم جگە لە موسوڵمانان کردووە(بە نووسەر)[2]، ئەم قسەی عومەرە (ڕەزای خوای لێ بێت) لەگەڵ ئەم ئایەتەدا بەڵگەیە لەسەر ئەوە کە دروست نیە ئەهلی زیمە بەکاربهێنرێ بۆ کاری نووسەری کە باس‌و خواستی نووسەری کە باس‌و خواستی موسوڵمانانی تێدابێ‌و ئاگاداری ئەو شتانە ببێ کە ترسی لێ بکرێ بەلاوی بکاتەوە بۆ ئەو دوژمنانەی لەگەڵ موسوڵماناندا لە شەڕدان، لەبەر ئەوەیە خودای گەورە ئەفەرموێت: ﴿لَا يَأْلُونَكُمْ خَبَالًا وَدُّوا مَا عَنِتُّمْ﴾ ئەوانە لە تێکدانتان درێغی ناکەن، هەر حەز دەکەن ناڕەحەتتان بکەن. پاشان خودای گەورە ئەفەرموێت: ﴿قَدْ بَدَتِ الْبَغْضَاءُ مِنْ أَفْوَاهِهِمْ وَمَا تُخْفِي صُدُورُهُمْ أَكْبَرُ﴾ جگە لەوەی کە دژایەتی ئێوەیان بە دەمدا دێت. ئەو کینەیەش کە لە دڵیاندایەو شاردویانەتەوە گەورەترە. واتە: دوژمنایەتی ئەوانە لە دەم‌و چاوو قسەکردنیانەوە دەردەکەوێ‌و دیارە. لەگەڵ ئەو هەموو ڕق‌و کینەیە کە لە دڵیاندایە بەرانبەر بە ئیسلام‌و موسوڵمانان کە لای هەموو کەسێکی خاوەن بیرو هۆش شاراوە نیە. هەر بۆیە خودای گەورە ئەفەرموێت: ﴿قَدْ بَيَّنَّا لَكُمُ الْآيَاتِ إِنْ كُنْتُمْ تَعْقِلُونَ﴾ زۆر نیشانەمان بۆ ئێوە ڕوون کردۆتەوە ئەگەر تێ بگەن. خودای گەورە ئەفەرموێت: ﴿هَا أَنْتُمْ أُولَاءِ تُحِبُّونَهُمْ وَلَا يُحِبُّونَكُمْ﴾ بزانن ئێوە ئەوانتان خۆش دەوێ بەڵام ئەوان ئێوەیان خۆش ناوێ، واتە: ئێوە ئەی موسوڵمان دووڕووەکانتان خۆش دەوێ کە خۆیان لای ئێوە بە موسوڵمان پیشان ئەدەن، بەڵام ئەوان بە ئاشکراو نهێنی ڕقیان لە ئێوەیە ﴿وَتُؤْمِنُونَ بِالْكِتَابِ كُلِّهِ﴾ ئێوە بڕواتان بە گشت کتێبەکان هەیە. واتە: هیچ گومان‌و دوودڵیەکتان نیە، بەڵام ئەوان هەمیشە بەو گومان‌و دوودڵ‌و سەرگەردانن. موحەممەدی کوڕی ئیسحاق ڕیوایەتی کردووە لە ئیبنوعەبباسەوە لەو دەقەدا کە خودای گەورە ئەفەرموێت: ﴿وَتُؤْمِنُونَ بِالْكِتَابِ كُلِّهِ﴾ وتی: واتە: ئێوە بڕواتان بە کتێبی خۆتان‌و ئەوانیش هەیە کە لە پێشا هاتوون. بەڵام ئەوان بڕوایان بە کتێبەکەی ئێوە نیە، هەقی ئێوەیە کە ڕقتان لەوان بێ. نەک ئەوان ڕقیان لە ئێوە

---

[1] فتح الباري (٢٠١/١٣)، النسائي (١٥٨/٧).

[2] إبن أبي حاتم (٥٠٠/٢).

بێ[1]. ئیبنوجەریر ڕیوایەتی کردووە. ﴿وَإِذَا لَقُوكُمْ قَالُوٓاْ ءَامَنَّا وَإِذَا خَلَوْاْ عَضُّواْ عَلَيْكُمُ ٱلْأَنَامِلَ مِنَ ٱلْغَيْظِ﴾ هەرکاتێ پێتان دەگەن دەڵێن: بڕوامان هێناوە، بەڵام هەر کە لێتان جیا دەبنەوە (لەو ڕقەی کە هەیانە) سەر پەنجەی خۆیان دەگەزن. قەتادە دەڵێت: ﴿ٱلْأَنَامِلَ﴾ سەرپەنجەکان[2] ئەمە خوڕەوشتی دووڕووەکانە بڕواهێنان‌و خۆشەویستی خۆیان دەردەبڕن بۆ موسوڵمانان، کەچی دڵیان بە پێچەوانەیە لە گشت ڕوویەکەوە. وەك خودای گەورە ئەفەرموێت: ﴿وَإِذَا خَلَوْاْ عَضُّواْ عَلَيْكُمُ ٱلْأَنَامِلَ مِنَ ٱلْغَيْظِ﴾ ئەو پەنجە گەزتنە ئەوپەڕی ڕق‌و کینەو نەفامیانە. خودای گەورەیش دەربارەیان ئەفەرموێت: ﴿قُلْ مُوتُواْ بِغَيْظِكُمْ﴾ بڵێ: دەك لە ڕقان بمرن، خودا بەوەی لە دڵدایە باش ئاگادارە. واتە: هەرچەندە ئێوە حەسوودی بەرن بە موسوڵمانان‌و داخ لە دڵ بن بەرانبەریان، چاك بزانن کە خودا ئەو چاکانەی خۆی تەواو دەکات بۆ عەبدە بڕوادارەکانی خۆی‌و ئاینەکەی تێرو تەواوو بەرز دەکاتەوەو سەری دەخات، سا دەی ئێوە بمرن بەو داخەوە ﴿إِنَّ ٱللَّهَ عَلِيمٌۢ بِذَاتِ ٱلصُّدُورِ﴾ بەڕاستی خودا ئاگادارە بەوەی لەناو دڵەکاندایە، واتە: لەو حەسودی‌و ڕق‌و کینەیە لەناو دڵەکانتانایەو شاردوتانەتەوە، هەر لە دنیادا بەو زوانە خودا تۆڵەتان لێ دەسێنێ، پێچەوانەی ئەوەتان پیشان ئەدا کە ئێوە چاوەڕوانی دەکەن، لە ڕۆژی قیامەتیشا سزای توندتان ئەدات لەناو جەهەنماو بە هەتا هەتایی دەمێننەوەو هەرگیز لێی نایەنە دەرەوە. پاشان خودای گەورە ئەفەرموێت: ﴿إِن تَمْسَسْكُمْ حَسَنَةٌ تَسُؤْهُمْ وَإِن تُصِبْكُمْ سَيِّئَةٌ يَفْرَحُواْ بِهَا﴾ ئەگەر چاکەیەکتان بێتە ڕێ خەم دەخۆن، ئەگەر تووشی ناخۆشی بێن پێیان خۆشە. ئەوەیش نیشانەی دوژمنایەتی لە ئەندازە بەدەریانە بەرانبەر خاوەن باوەڕان کاتێ کە سەرکەوتنێ بەدەست دێنن‌و یارمەتی دەریان زۆر دەبێ‌و خەڵکی ڕوو لە ئیسلام دەکەن دووڕووەکان زۆر خەفەت دەخۆن‌و ئارامیان لێ ئەبڕێ. خۆ ئەگەر موسوڵمانان تووشی نسکۆیە بێن یان قات‌و قڕیەك ڕوویان تێبکات‌و خودا مەیلی لێ بێت موسوڵمانان تاقی بکاتەوە (وەك لە ڕۆژی ئوحددا ڕوویدا) دووڕووەکان زۆر دڵخۆش دەبن بەوە. خودای گەورەیش ڕووی وتاری دەکاتە خاوەن باوەڕان‌و ئەفەرموێت: ﴿وَإِن تَصْبِرُواْ وَتَتَّقُواْ لَا يَضُرُّكُمْ كَيْدُهُمْ شَيْـًٔا﴾ ئەگەر ئێوە خۆڕاگرو پارێزگار بن، گزی‌و فێڵیان هیچ زیان لە ئێوە نادات. خودای گەورە ڕێنمایان دەکات بۆ خۆپاراستن لە شەڕی شەڕخوازان‌و فێڵی بەدکاران بۆ پشت بەستن بە خوداو خۆڕاگری‌و لەخواترسان، چونکە خودا ئاگای لە دوژمنەکانیانەو هیچ توانا و دەستەڵاتێکیان

---

[1] الطبري (٧/١٤٩).

[2] الطبري (٧/١٥٣).

نیە بەرانبەر تواناو دەستەڵاتی خودا. هەر خودا مەیلی هەر شتێکی ببێ دەیکاتو مەیلی لە هەر شتێکیش نەبێ هەرگیز نابێ. هیچ شتێ لەم بونەوەرەدا ڕوو نادا بە مەیلیو ئیزنی ئەو نەبێ. هەرکەسێ پشتی بە خودا بەستبێ ئەوەی بەس بووە. ﴿إِنَّ ٱللَّهَ بِمَا يَعۡمَلُونَ مُحِيطٌ﴾ خودا بە کردەوەیان دەزانێ. پاشان خودای گەورە دێتە سەر باسی بەسەرهاتی ئوحودو ئەو تاقیکردنانەوەی تووشی خاوەن باوەڕان دێت تێداو جیا کردنەوەی خاوەن باوەڕان لە دووڕووەکانو باسی خۆڕاگری خاوەن باوەڕان لە ئوحوددا.

﴿وَإِذۡ غَدَوۡتَ مِنۡ أَهۡلِكَ تُبَوِّئُ ٱلۡمُؤۡمِنِينَ مَقَٰعِدَ لِلۡقِتَالِۗ وَٱللَّهُ سَمِيعٌ عَلِيمٌ ﴿١٢١﴾ إِذۡ هَمَّت طَّآئِفَتَانِ مِنكُمۡ أَن تَفۡشَلَا وَٱللَّهُ وَلِيُّهُمَاۗ وَعَلَى ٱللَّهِ فَلۡيَتَوَكَّلِ ٱلۡمُؤۡمِنُونَ ﴿١٢٢﴾ وَلَقَدۡ نَصَرَكُمُ ٱللَّهُ بِبَدۡرٖ وَأَنتُمۡ أَذِلَّةٞۖ فَٱتَّقُواْ ٱللَّهَ لَعَلَّكُمۡ تَشۡكُرُونَ ﴿١٢٣﴾﴾

**باسی غەزای ئوحود**

خودای گەورە ئەفەرموێت: ﴿وَإِذۡ غَدَوۡتَ مِنۡ أَهۡلِكَ تُبَوِّئُ ٱلۡمُؤۡمِنِينَ مَقَٰعِدَ لِلۡقِتَالِۗ وَٱللَّهُ سَمِيعٌ عَلِيمٌ﴾ کاتێ کە تۆ (ئەی موحەممەد (ﷺ)) سەر لە بەیانی کەسو کاری خۆت جێهێشتو جێگەت بۆ خاوەن باوەڕان لە شەرگەدا دیاری کرد، خودا دەبیبیستو دەیزانی. مەبەست بەم ڕووداوە ڕۆژی ئوحودە بە کۆدەنگی زانایان. ئیبنوعەبباسو حەسەنو قەتادەو سوودیو کەسانی تریش هەر وایان وتوە[1] ڕووداوی ئوحود لە ڕۆژی شەممەداو لە مانگی شەووالدا لە ساڵی سێهەمی کۆچیدا ڕوویدا. عیکرمە وتی: ڕووداوی ئوحود لە ڕۆژی شەممە، نیوەی شەووالدا بوو والله أعلم. هۆی ڕوداوەکە ئەوە بوو، بت پەرستەکان ئەو هەموو پیاوە ناودارو گەورانەیان لێ کوژرا لە ڕۆژی بەدرا، کاروانەکەیان بێ زیان بەو هەموو کەلوپەلی بازرگانیەوە ڕزگاری بوو کە ئەبوسوفیان سەر کاروانی بوو. کاتێ کاروانەکە گەڕایەوە مەککە کوڕی ئەوانە کە کوژرابوونو هەندێ لەو پیاوانەش کە قسە ڕەوا بوون لەگەڵ ئەبوسوفیان مابونەوە، بڕیاریان دا کە ئەو سامانە دانێن بۆ شەڕ کردن دژی موحەممەد (ﷺ) لەو شەڕەدا خەرجی بکەن، خەڵکێکی زۆریان لەگەڵ حەبەشیەکاندا کۆکردەوە بە نزیکەی سێ هەزار کەسەوە کەوتنە ڕێ هەتا نزیکی ئوحود بونەوە ڕووەو مەدینە. پێغەمبەری خودا (ﷺ) نوێژی هەینی کرد، کە نوێژی تەواو کرد. پاشان لە ماڵی پیاوێکی بەنی نەجار نوێژی کردو کە مالیکی کوڕی عەمریان پێ دەوت، ڕاوێژی بەو خەڵکە کرد ئایا دەرچێ بۆیان یان لە مەدینەدا بمێنێتەوە، عەبدوڵلای کوڕی ئوبەیی ئامازەی بەوە کرد کە لە مەدینە بمێننەوە، ئەگەر لە دەوری مەدینە مانەوە پاش ماوەیەك

[1] إبن أبي حاتم (٢/٥١٠).

هیچیان پێ ناکرێ و دەگەڕێنەوە، خۆ ئەگەر هاتن بۆ ناو مەدینە پیاوەکان ڕووبەڕوویان دەوەستن‌و ژنان‌و منداڵانیش لەسەریانەوە بەردەبارانیان دەکەن. هەندێ لە هاوەڵەکانی تر کە ئامادەی غەزای بەدر نەبوبون، ڕایان وابوو بچنە دەرەوە بۆیان لە مەدینە، پێغەمبەری خودا (ﷺ) چووە ماڵەوەو چەك‌و پێویستی شەڕی پۆشی‌و هاتە دەرەوە بۆلایان، هەندێکیان پەشیمان بونەوەو وتیان: لەوانەیە ئێمە پێغەمبەرمان (ﷺ) والێکردبێ کە بچێتە دەرەوە، وتیان: ئەی پێغەمبەری خودا (ﷺ) ئەگەر حەز دەکەی دەمێنینەوە پێغەمبەری خودا (ﷺ) فەرمووی: (بۆ هیچ پێغەمبەرێ نیە کاتێ کە چەك‌و پێویستی شەڕی پۆشی بگەڕێتەوە هەتا خوا بڕیاری بۆ ئەدا) پێغەمبەری خودا بە هەزار کەسەوە لە هاوەڵەکانی کەوتە ڕێ، لە نێوان مەدینەو ئوحودا بەەن، عەبدوڵڵای کوڕی ئوبەیی بە تورەیەوە بە سێیەکی سوپاکەوە گەڕایەوە بۆ مەدینە. لەبەر ئەوە کە بەقسەی ئەویان نەکرد، خۆی‌و هاوەڵەکانی کە لەگەڵی گەڕانەوە دەیان وت: ئەگەر بمانزانیایە ئەمڕۆ شەڕ دەکەن لەگەڵتان دەهاتین، بەڵام واتان لێ نابینین ئەمڕۆ شەڕ بکەن. پێغەمبەری خودا (ﷺ) درێژەی دا بە ڕۆشتن هەتا گەیشتە کەناری شیوی ئوحودو پشتیان کردە کێوی ئوحود فەرمووی: (هیچ کەسێ شەڕ ناکات، هەتا فەرمانی شەڕی پێ ئەدەین) لەوکاتەدا پێغەمبەری خودا (ﷺ) ئامادەکاری دەکرد بۆ شەڕەکە بە حەوت سەد کەسەوە لە هاوەڵەکانی. عەبدوڵڵای کوڕی جوبەیری کردە سەرۆکی تیر ئەندازەکان، کە ژمارەیان لەو ڕۆژەدا پەنجا کەس بوو. فەرمووی پێیان: (ئێوە پارێزگاریمان لەو سورانە لێ بکەن، با لەلای ئێوەوە نەیەن پەلامارمان بدەن، لە شوێنی خۆتان بمێننەوەو نەجوڵێن، ئەگەر ئێمە پەلاماری ئەوانمان دا، یان ئەوان هاتنە سەر ئێمە، ئەگەر ئێمەتان بینی باڵندە دەیفڕاندین شوێنی خۆتان بەجێ نەهێڵن) پێغەمبەری خودا (ﷺ) خۆی سەرپەرشتی شەڕەکەی دەکرد، ئالاکەی دایە دەست مەسعەبی کوڕی عومەیرو، کۆمەڵێ لاوی تازە پێگەیشتوو هاتبوون لەگەڵ سوپاکەدا ئیزنی هەندێکیانی داو هەندێکیانی گەڕاندەوە، دوای دوو ساڵ لە غەزای خەندەقا بەشداری پێکردن. قورەیشیەکان خۆیان ئامادە کردبوو ژمارەیان سێ هەزار کەس دەبوو لەگەڵ دووسەد ئەسپی سواریدا، لەم لاو لای خۆیانەوە، لەلای ڕاستەوە خالیدی کوڕی وەلیدو لەلای چەپەوە عیکرمەی کوڕی ئەبوجەهل سەرکردەیی دەکردن، ئالاکەشیان دابوە دەست نەوەی عەبدودار پاشان ئەوەی لە نێوان ئەو دوو کۆمەڵەدا ڕووی دا بە درێژی لە شوێنی خۆی باسی دەکەین لە تەفسیری ئایەتەکاندا بە یارمەتی خودای گەورە. بۆیە خودای گەورە ئەفەرموێت: ﴿وَإِذْ غَدَوْتَ مِنْ أَهْلِكَ تُبَوِّئُ الْمُؤْمِنِينَ مَقَاعِدَ لِلْقِتَالِ﴾ ئەوسا کە تۆ سەرلەبەیانی کەس‌و کاری خۆت جێهێشت‌و جێگەت لە شەڕگەدا بۆ خاوەن باوەڕان دیاری کرد. واتە: هەرکەسەو لە شوێنی خۆی داناو بەلای ڕاست‌و بەلای چەپدا دابەشت کردن‌و ئامادەت کردن بۆ پەلاماردانی دوژمن

﴿وَٱللَّهُ سَمِيعٌ عَلِيمٌ﴾ خـودا دەبیـسێت‌و دەزانـێ. چـی دەڵـێن دەیبیـسێ‌و ئاگـاداری نـاو دڵتانـە. پاشـان خودای گەورە ئەفەرموێت: ﴿إِذْ هَمَّت طَّآئِفَتَانِ مِنكُمْ أَن تَفْشَلَا﴾ لەوکاتەشدا کە دوو دەستە هـەر لـە خۆتان خەریکی ورە بەردان بوون. بوخاری ڕیوایەتی کردووە لە جابیری کوڕی عەبدوڵلاوە، وتـی: ئـەم ئایەتەلەسەر ئێمە هاتە خوا کە خـودای گەورە ئەفـەرموێت: ﴿إِذْ هَمَّت طَّآئِفَتَانِ مِنكُمْ أَن تَفْشَلَا﴾ ئێمە دوو کۆمەڵ بووین، نەوەی حاریسەو نەوەی سەلەمە. پێمان خۆش نەبوو، سوفیان جارێ وتـی: پـێم خۆش نەبوو ئەگەر ئـەم ئایەتـە نەهاتایەتـە خـوارەوە، لەبـەر ئەمـە خـودای گـەورە ئەفـەرموێت: ﴿وَٱللَّهُ وَلِيُّهُمَا﴾[1] هەر خوا بە هانایانەوە هات. موسلیمش هـەروا ڕیوایـەتی کـردووە لـە فەرموودەکـەی سـوفیانی کوڕی عویەینەوە[2]. ﴿وَعَلَى ٱللَّهِ فَلْيَتَوَكَّلِ ٱلْمُؤْمِنُونَ﴾ باوەڕداران هەردەبێ کاروباریان بە خوا بسپێرن.

## وەبیرهێنانەوەی یارمەتی خودا لە ڕۆژی بەدرا لەگەڵ کەمی ژمارەو کەرەسەی جەنگدا

خـودای گـەورە ئەفـەرموێت: ﴿وَلَقَدْ نَصَرَكُمُ ٱللَّهُ بِبَدْرٍ وَأَنتُمْ أَذِلَّةٌ﴾ وا دیتـان خـودا لـە شـەڕی بـەدرا سەری خستن، هەرچەندە کـەم‌و بـێ هێـزیش بـوون. شـەڕی بـەدر لـە ڕۆژی هـەینیا بـوو کـە ڕێکـەوتی حەڤدەی مانگە ڕەمەزان بوو لەساڵی دووهـەمی کۆچیدا. ئـەو ڕۆژە ڕۆژی جیاکردنـەوە بـوو کـە خـودا ئیسلام‌و موسوڵمانی سەربڵند کردو بت پەرستانی لووت شکاندو لە خوێنی خۆیاندا گەوزانـدنی، لەگەڵ کەمی ژمارەی موسوڵمانانـدا لەو ڕۆژەدا، چونکە ژمارەیان لـە سـێ سـەدو سیانزە کـەس زیـاتر نـەبوو. هەندێ سوارەو حەفتا وشتریان پێ بوو، ئەوانی تر پیادە بوون. بەپێی پێویستی خۆشیان کەرەسـتەی جەنگیان لەگەڵا نەبوو. دوژمنیش لەو ڕۆژەداژمارەیان لە نێوان حـەوت سـەد کـەس هـەتا هـەزار کـەس دەبوو. بە هەموو کەرەسەی جەنگ‌و سوارچاکی بـە توانـاو زێـڕو پارەیـەکی زۆرەوە هـاتبوون. خـودای گەورە پێغەمبەرەکەی زاڵ کـردو نیگـاو پەیامەکـەی خـۆی سەرخـست‌و ڕووی پێغەمبەرەکـەی‌و شـوێن کەوتوانی سپی کردو شەیتان‌و شوێن کەوتوانیشی زەلیل‌و ڕسوا کرد، هـەر بۆیـە خـودای گـەورە منـەت دەکات بەسەر عەبدە خاوەن باوەڕەکانی‌و کۆمەڵە لە خوا ترسەکانیداو ئەفـەرموێت: ﴿وَلَقَدْ نَصَرَكُمُ ٱللَّهُ بِبَدْرٍ وَأَنتُمْ أَذِلَّةٌ﴾ بێگومان خودا لە شەڕی بەدرا سەری خستن، هەرچەندە کەم‌و لاوازیش بوون. تا باش بزانن کە سەرکەوتن هەر لەلای خودایە، بـە زۆری ژمـارەو چـەک‌و پێویستی جـەنگ نیـە. وەك خـودای گەورە لە ئایەتێکی تـردا ئەفـەرموێت: ﴿وَيَوْمَ حُنَيْنٍ إِذْ أَعْجَبَتْكُمْ كَثْرَتُكُمْ فَلَمْ تُغْنِ عَنكُمْ

---

[1] فتح الباري (٨/٦٣).

[2] مسلم (٤/١٩٤٨).

شَيْئًا﴾ تاكو ﴿وَٱللَّهُ غَفُورٌ رَّحِيمٌ﴾[1] وە لە ڕۆژی حونوینیشا، كە هەرچەندە بە زۆری خۆتان دەنازی، كەچی هیچ سوودی پێ نەگەیاندەن، هەتا. خودا دەبوریۆ دلۆڤانە. (بەدر) شوێنێكە لە نێوان مەككەو مەدینەدا، بە بیرەكانیەوە ناسراوە. بەناوی پیاوێكەوە ناونراوە كە هەڵی كەندوە، پێی دەڵێن: (بەدری كوڕی نارین) پاشان خودای گەورە ئەفەرموێت: ﴿فَٱتَّقُواْ ٱللَّهَ لَعَلَّكُمْ تَشْكُرُونَ﴾ سا هەر لە خوا بترسن، بەڵكو شوكری بەجێ بێنن. واتە: گوێڕایەڵی بكەنو بیپەرستن.

﴿إِذْ تَقُولُ لِلْمُؤْمِنِينَ أَلَن يَكْفِيَكُمْ أَن يُمِدَّكُمْ رَبُّكُم بِثَلَٰثَةِ ءَالَٰفٍ مِّنَ ٱلْمَلَٰٓئِكَةِ مُنزَلِينَ ﴿١٢٤﴾ بَلَىٰٓ ۚ إِن تَصْبِرُواْ وَتَتَّقُواْ وَيَأْتُوكُم مِّن فَوْرِهِمْ هَٰذَا يُمْدِدْكُمْ رَبُّكُم بِخَمْسَةِ ءَالَٰفٍ مِّنَ ٱلْمَلَٰٓئِكَةِ مُسَوِّمِينَ ﴿١٢٥﴾ وَمَا جَعَلَهُ ٱللَّهُ إِلَّا بُشْرَىٰ لَكُمْ وَلِتَطْمَئِنَّ قُلُوبُكُم بِهِۦ ۗ وَمَا ٱلنَّصْرُ إِلَّا مِنْ عِندِ ٱللَّهِ ٱلْعَزِيزِ ٱلْحَكِيمِ ﴿١٢٦﴾ لِيَقْطَعَ طَرَفًا مِّنَ ٱلَّذِينَ كَفَرُوٓاْ أَوْ يَكْبِتَهُمْ فَيَنقَلِبُواْ خَآئِبِينَ ﴿١٢٧﴾ لَيْسَ لَكَ مِنَ ٱلْأَمْرِ شَىْءٌ أَوْ يَتُوبَ عَلَيْهِمْ أَوْ يُعَذِّبَهُمْ فَإِنَّهُمْ ظَٰلِمُونَ ﴿١٢٨﴾ وَلِلَّهِ مَا فِى ٱلسَّمَٰوَٰتِ وَمَا فِى ٱلْأَرْضِ ۚ يَغْفِرُ لِمَن يَشَآءُ وَيُعَذِّبُ مَن يَشَآءُ ۚ وَٱللَّهُ غَفُورٌ رَّحِيمٌ ﴿١٢٩﴾﴾

## یارمەتیدان بە فریشتەكان

خودای گەورە ئەفەرموێت: ﴿إِذْ تَقُولُ لِلْمُؤْمِنِينَ أَلَن يَكْفِيَكُمْ أَن يُمِدَّكُمْ رَبُّكُم بِثَلَٰثَةِ ءَالَٰفٍ مِّنَ ٱلْمَلَٰٓئِكَةِ مُنزَلِينَ﴾ كاتێ كە تۆ بە خاوەن باوەڕانت ڕاگەیاند: ئەگەر خوا سێ هەزار لە فریشتەكانی بۆ ئێوە بنێرێتە خوارو بێتە یارمەتیتان بەستان نیە؟ زانایانی تەفسیر جیاوازیان هەیە لەم بەڵێنەدا، ئایا ئەم بەڵێنە لە ڕۆژی بەدرا بووە یان لە ڕۆژی ئوحودا؟ بۆ دوو ڕا:

**ڕای یەكەم:** كە خودای گەورە ئەفەرموێت: ﴿إِذْ تَقُولُ لِلْمُؤْمِنِينَ﴾ پەیوەندی هەیە بەو ئایەتەوە كە خودای گەورە ئەفەرموێت: ﴿وَلَقَدْ نَصَرَكُمُ ٱللَّهُ بِبَدْرٍ﴾ ئەم ڕایە ڕیوایەت كراوە لە حەسەنی بەسریو عامیری شەعبیو ڕەبیعی كوڕی ئەنەسو كەسانی تریشەوە[2] ئیبنوجەریریش هەر ئەم ڕایەی هەڵبژاردوە. عبادی كوڕی مەنسور وتی لە حەسەنەوە لەم ئایەتەدا: ﴿تَقُولُ لِلْمُؤْمِنِينَ أَلَن يَكْفِيَكُمْ أَن يُمِدَّكُمْ رَبُّكُم بِثَلَٰثَةِ ءَالَٰفٍ مِّنَ ٱلْمَلَٰٓئِكَةِ﴾ وتی: ئەمە لە ڕۆژی بەدرا بووە.[3] ئیبنوئەبی حاتەمیش ڕیوایەتی كردووە. پاشان ڕیوایەت كراوە لە عامیر شەعبیەوە وتی: موسوڵمانەكان هەواڵیان پێ گەیشت

---

[1] التوبة (٢٥-٢٧).

[2] إبن أبي حاتم (٥١٩-٥٢١).

[3] الطبري (١٧٤/٧).

کە کورزی کوڕی جابیر هاوکاری بت پەرستەکان دەکات. زۆریان بەلاوە گران بوو، خودای گەورە ئەم ئایەتەی ناردە خوارەوە کە ئەفەرموێت: ﴿أَلَن يَكْفِيَكُمْ أَن يُمِدَّكُمْ رَبُّكُم بِثَلَٰثَةِ ءَالَٰفٍ مِّنَ ٱلْمَلَٰٓئِكَةِ مُنزَلِينَ ﴿١٢٤﴾ بَلَىٰٓ إِن تَصْبِرُوا۟ وَتَتَّقُوا۟ وَيَأْتُوكُم مِّن فَوْرِهِمْ هَٰذَا يُمْدِدْكُمْ رَبُّكُم بِخَمْسَةِ ءَالَٰفٍ مِّنَ ٱلْمَلَٰٓئِكَةِ مُسَوِّمِينَ﴾ وتی: کورز تووشی شکست هاتو هاوکاری بت پەرستانی نەکرد، خودایش پێنج هەزار فریشتەکەی نەنارد بۆ یارمەتیان[1] ڕەبیعی کوڕی ئەنەس وتی: خودای گەورە بە هەزار فریشتە هاوکاری موسوڵمانانی کرد پاشان بوو بە سێ هەزار، دوای ئەوەیش بوو بە پێنج هەزار[2] ئەگەر وترا: چۆن ئەم ئایەتە ڕێك دەخەی لەسەر ئەم قسەیە لەگەڵ ئەو ئایەتەدا کە خودای گەورە لە بەسەرهاتی بەدرا ئەفەرموێت: ﴿إِذْ تَسْتَغِيثُونَ رَبَّكُمْ فَٱسْتَجَابَ لَكُمْ أَنِّى مُمِدُّكُم بِأَلْفٍ مِّنَ ٱلْمَلَٰٓئِكَةِ مُرْدِفِينَ ﴿٩﴾ وَمَا جَعَلَهُ ٱللَّهُ إِلَّا بُشْرَىٰ وَلِتَطْمَئِنَّ بِهِۦ قُلُوبُكُمْ ۚ وَمَا ٱلنَّصْرُ إِلَّا مِنْ عِندِ ٱللَّهِ ۚ إِنَّ ٱللَّهَ عَزِيزٌ حَكِيمٌ﴾[3] لەو کاتەشدا کە هاناتان بۆ پەروەردگارتان دەبرد، فەرمووی: ئەوا بە شوێن یەکدا هەزار فریشتە دەنێرم بۆ یارمەتیتان خودا ئەو بەڵێنەی هەر بۆیە پێدان، هەتا مژدەیەك بێو دڵەکانتان پێی ئارام بگرێ، یارمەتیش هەر لە خواوەیە، خودا خاوەن دەستەڵاتی لەکارزانە. وەڵامەکەی: ناهێنانی هەزار فریشتە لێرەدا، دژایەتی نیە لەگەڵ هێنانی سێ هەزار یان زیاتر لە فریشتەکان کە ئەفەرموێت: ﴿مُرْدِفِينَ﴾ بە شوێن یەکدا. واتە: بە شوێنی ئەواندا فریشتەی تر دەنێریو بە دوای ئەوانەیشا هی تر دەنێرێ، ئەم دەقانە لەو دەقانە دەچێ لە سورەتی ئالی عیمراندان، بەڵام وادیارە ئەمە لە ڕۆژی بەدرا بووە، وەك زانراوە کە شەڕی فریشتەکان لە ڕۆژی بەدرا بووە. والله أعلم. پاشان خودای گەورە ئەفەرموێت: ﴿بَلَىٰٓ إِن تَصْبِرُوا۟ وَتَتَّقُوا۟ وَيَأْتُوكُم مِّن فَوْرِهِمْ هَٰذَا﴾ بەڵێ، ئەگەر خۆ ڕاگرنو ترستان لە خوا هەبێ، پەلامارتان بدەن لەو کاتەدا.

**ڕای دووهەم:** ئەم بەڵێنە پەیوەندی هەیە بەم ئایەتەوە کە خودای گەورە ئەفەرموێت: ﴿وَإِذْ غَدَوْتَ مِنْ أَهْلِكَ تُبَوِّئُ ٱلْمُؤْمِنِينَ مَقَٰعِدَ لِلْقِتَالِ﴾ ئەمە لە ڕۆژی ئوحودا بووە، بەڵام لەو ڕۆژەدا یارمەتی فریشتەکان ڕووی نەداوە، بەپێی ئەم ئایەتە کە خودای گەورە ئەفەرموێت: ﴿بَلَىٰٓ إِن تَصْبِرُوا۟ وَتَتَّقُوا۟﴾ بەڵێ ئەگەر خۆڕاگرنو لە خوا بترسن. خۆیان نەگرت بەڵکو ڕایان کرد، بۆیە بە تەنیا

---

[1] إبن أبي حاتم (٢/٥٢).

[2] الطبري (١٧٨/٧).

[3] الانفال (٩-١٠).

فریشتەیەکیش یارمەتی نەدران. خودای گەورە ئەفەرموێت: ﴿بَلَىٰٓ إِن تَصۡبِرُواْ وَتَتَّقُواْ﴾ واتە: بەڵێ ئەگەر خۆڕاگرن بەرانبەر دوژمنو بترسن لێمو فەرمانەکانم بەجێ بێنن ﴿وَيَأۡتُوكُم مِّن فَوۡرِهِمۡ هَٰذَا﴾ لە کاتی پەلاماردانی دوژمندا. خودا یارمەتیان ئەدات. حەسەنو قەتادەو ڕەبیعو سوودی وتیان: واتە لەم ڕووبەڕوو بونەوەیاندا[1]. عەوفی وتی لە ئیبنوعەبباسەوە: لەم سەرەیانا وە وتراوە: لە کاتی ئەم ڕق هەڵسانەیاندا[2] ﴿يُمۡدِدۡكُمۡ رَبُّكُم بِخَمۡسَةِ ءَالَٰفٖ مِّنَ ٱلۡمَلَٰٓئِكَةِ مُسَوِّمِينَ﴾ پەروەردگارتان پێنج هەزار لە فریشتەکانی بە دروشمو بە یارمەتیەوە دەنێرێ. واتە: بە دروشمەوە دەناسرێن. ئەبوئیسحاقی سەبیعی وتی: لە حاریسەی کوڕی موزەڕیبەوە لە عەلی کوڕی ئەبوتالیبەوە (ڕەزای خوای لێ بێت) وتی: نیشانەی فریشتەکان لە ڕۆژی بەدرا خوری سپی بووە[3]. وە نیشانەکانیشان بە نێوچاوان وڵاغەکانیانەوە بووە. مەکحول وتی: بە مێزەرەکانیانەوە دەناسران، چونکە نیشانەی فریشتەکان لە ڕۆژی بەدرا مێزەری ڕەش بوو. وە لە ڕۆژی حونەینا مێزەری سوور بوو. ڕیوایەت کراوە لە ئیبنوعەبباسەوە وتی: فریشتەکان لە ڕۆژی بەدرا نەبێ شەڕیان نەکردووە[4]، ئیبنوئەبی حاتەم ڕیوایەتی کردووە لە یەحیای کوڕی عبادە وە کە زوبەیرە (ڕەزای خوای لێ بێت) لە ڕۆژی بەدرا مێزەرەیەکی زەردی پێچا بوو، فریشتەکانیش بە مێزەری زەردەوە دابەزین بۆیان[5]. خودای گەورە ئەفەرموێت: ﴿وَمَا جَعَلَهُ ٱللَّهُ إِلَّا بُشۡرَىٰ لَكُمۡ وَلِتَطۡمَئِنَّ قُلُوبُكُم بِهِۦۗ وَمَا ٱلنَّصۡرُ إِلَّا مِنۡ عِندِ ٱللَّهِ ٱلۡعَزِيزِ ٱلۡحَكِيمِ﴾ خودا هەر بۆ ئەوە مژدەیەك بە ئێوە بداتو هەر بۆ ئەوە دڵنیا بن ئەو کارەی کرد، سەرکەوتنیش هەر بە دەستی خودای خاوەن دەستەڵاتی لەکارزانە. واتە: خودا ئەو فریشتانەی نەناردوە ئاگاداری نەکردون بە دابەزاندنیان تەنیا بۆ ئەوە بوو مژدەتان بداتیو دڵنیاو دڵخۆشتان بکات، ئەگینا سەرکەوتن هەر لەلای خودایە، ئەگەر بیەوێ سەردەکەوێ بەسەر دوژمنەکانیا بەبێ ئێوەو بێ ئەوەی پێویستی بە شەڕ کردنی ئێوە ببێ. وەك خودای گەورە دوای ئەوەی کە فەرمان دەکات بە خاوەن باوەڕان ئەفەرموێت: ﴿ذَٰلِكَۖ وَلَوۡ يَشَآءُ ٱللَّهُ لَٱنتَصَرَ مِنۡهُمۡ وَلَٰكِن لِّيَبۡلُوَاْ بَعۡضَكُم بِبَعۡضٖۗ وَٱلَّذِينَ قُتِلُواْ فِي سَبِيلِ ٱللَّهِ فَلَن يُضِلَّ أَعۡمَٰلَهُمۡ ۝٤ سَيَهۡدِيهِمۡ وَيُصۡلِحُ بَالَهُمۡ ۝٥ وَيُدۡخِلُهُمُ ٱلۡجَنَّةَ عَرَّفَهَا لَهُمۡ﴾[6] ئەگەر خودا بیویستایە، بۆخۆی تۆڵەی لێ

---

[1] إبن أبي حاتم (٢/٥٢٣-٥٢٤).

[2] الطبري (٧/١٨٢).

[3] إبن أبي حاتم (٢/٥٢٥).

[4] إبن أبي شيبة (١٤/٣٥٤).

[5] إبن أبي حاتم (٢/٥٢٧).

[6] محمد (٤-٦).

دەسەندن، بەڵام ویستی بەیەکتری تاقیتان بکاتەوە، ئەو کەسانەش کە لە ڕێی خودا کوژران، کردەوەیان بەفیڕۆ نادات. بەو زووانە ڕێگەیان پێ نیشان دەداتو کاروباری ژیانیان بۆ سامان ئەدا. دەشیانباتە ئەو بەهەشتەی کە لە پێشا بۆی باس کردون. هەر بۆیە لێرەیشدا ئەفەرموێت: ﴿وَمَا جَعَلَهُ اللَّهُ إِلَّا بُشْرَىٰ لَكُمْ وَلِتَطْمَئِنَّ قُلُوبُكُم بِهِۦ ۗ وَمَا النَّصْرُ إِلَّا مِنْ عِندِ اللَّهِ الْعَزِيزِ الْحَكِيمِ﴾ واتە: هەر خودا خاوەن دەسەڵاتی تەواوو مەزنەو لە کارزانە لە بڕیارو فەرمانەکانیا. پاشان خودای گەورە ئەفەرموێت: ﴿لِيَقْطَعَ طَرَفًا مِّنَ الَّذِينَ كَفَرُوا﴾ خودا دەیویست لەو ڕۆژەدا هەندێ لە خوانەناسەکان لە خوێنی خۆیاندا بگەوزێنێ. ﴿أَوْ يَكْبِتَهُمْ فَيَنقَلِبُوا خَائِبِينَ﴾ ئەوەیش ماونەتەوە دەمکوت بکاتو بە نائومێدی بگەڕێنەوە. واتە: بە سەر شۆڕیو ڕسواییو داخو خەفەتێکی زۆرەوە بیان گێڕێتەوە، دوای ئەوەی کە هیچ دەستکەوتێکیان بەرانبەر بە ئێوە بە دەس نەهێنا، پاشان خودای گەورە ئەفەرموێت: ﴿لَيْسَ لَكَ مِنَ الْأَمْرِ شَيْءٌ﴾ تۆ هیچ کارێکت بە کاری ئەوانەوە نیە. واتە: هەموو بڕیارێك لە دنیاو لە ڕۆژی قیامەتدا تەنیا بە دەستی خودایە کە هاوەڵی نیەو هەمووی دێتەوە بۆ لای ئەوە. وەك لە ئایەتی تریشدا ئەفەرموێت: ﴿فَإِنَّمَا عَلَيْكَ الْبَلَاغُ وَعَلَيْنَا الْحِسَابُ﴾[1] بێگومان تۆ هەر ڕاگەیاندنت لەسەرە، لێپرسینەوە لەسەر ئێمەیە. وە ئەفەرموێت: ﴿لَّيْسَ عَلَيْكَ هُدَاهُمْ وَلَٰكِنَّ اللَّهَ يَهْدِي مَن يَشَاءُ﴾[2] شارەزا کردنی ئەوانە لەسەر تۆ نیە، بەڵکو خودا مەیلی لە هەر کەس بوێ شارەزای دەکات. وە ئەفەرموێت: ﴿إِنَّكَ لَا تَهْدِي مَنْ أَحْبَبْتَ وَلَٰكِنَّ اللَّهَ يَهْدِي مَن يَشَاءُ﴾[3] تۆ ناتوانی ئەوەی خۆشت دەوێ شارەزای بکەی، بەڵکو خودا مەیلی لە هەرکەسێ بێ شارەزای دەکات. موحەممەدی کوڕی ئیسحاق لەم ئایەتەدا: ﴿لَيْسَ لَكَ مِنَ الْأَمْرِ شَيْءٌ﴾ تۆ کارت بە کاری ئەوانەوە نیە. وتی: واتە: تۆ ئەی موحەممەد (ﷺ) بۆت نیە هیچ بڕیارێ بدەی دەربارەی عەبدەکانی من جگە لەوەی کە خۆم فەرمانم پێداوی بیکەی بەرانبەریان[4]. پاشان خودای گەورە دێتە سەر باسی ئەوەی کە چی دەربارەی خوانەناسان دەکاتو ئەفەرموێت: ﴿أَوْ يَتُوبَ عَلَيْهِمْ﴾ ج لەو کارەی کردویانە پەشیمان بنەوەو ڕێنماییان بکاتو لە گومرایی ڕزگاریان کاو لێیان خۆش بێ ﴿أَوْ يُعَذِّبَهُمْ﴾ یان لەسەر ناهەقیو

---

[1] الرعد (٤٠).

[2] البقرة (٢٧٢).

[3] القصص (٥٦).

[4] الطبري (٧/١٩٥).

خوانەناسیەکەیان سزایان بدات لە دنیاو لە قیامەتدا. واتە: تۆ بەرپرس نیت لەوە خودا خۆی دەزانێ شایستەی چین. بوخاری ڕیوایەتی ردوە لە ئسالمەوە لە باوکیەوە کە بیستویەتی لە پێغەمبەری خودا (ﷺ) کاتێ کە سەری بەرز دەکردەوە لە ڕکاتی دووهەما لە ڕکوعا لە نوێژی بەیانیا ئەیفەرمو: (خودایە نەفرەت بکە لە فلان و فلان) دوای ئەوە ئەیفەرموو: (سمع الله لمن حمده ربنا و لك الحمد) خودای گەورە ئەم ئایەتەی ناردە خوارەوە: ﴿لَيْسَ لَكَ مِنَ الْأَمْرِ شَيْءٌ﴾[1] نەسائیش هەروا ڕیوایەتی کردووە[2] ئیمامی ئەحمەد ڕیوایەتی کردووە لە سالمەوە لە باوکیەوە وتی: بیستم لە پێغەمبەری خودا (ﷺ) ئەیفەرموو: (خودایە نەفرەت بکە لە فلان. خودایە نەفرەت بکە لە حاریسی کوڕی هیشام، خودایە نەفرەت بکە لە سوهەیلی کوڕی عەمر، خودایە نەفرەت بکە لە سەفوانی کوڕی ئومەییە) لەو کاتەدا ئەم ئایەتە هاتە خوارەوە: ﴿لَيْسَ لَكَ مِنَ الْأَمْرِ شَيْءٌ أَوْ يَتُوبَ عَلَيْهِمْ أَوْ يُعَذِّبَهُمْ فَإِنَّهُمْ ظَالِمُونَ﴾ پاشان ئەوانە هەموو بڕوایان هێناو خودا لە هەموویان خۆش بوو.[3] دیسان بوخاری ڕیوایەتی کردووە لە ئەبوهورەیرەوە (ڕەزای خوای لێ بێت) وتی: کاتێ پێغەمبەری خودا (ﷺ) دوعای لە کەسێ بکردایە یان دوعای بۆ کەسێ بکردایە دوای ڕکوع قونوتی دەخوێند، جاری وایش هەبوو کاتێ کە ئەیفەرموو: (سمع الله لمن حمده ربنا لك الحمد) پاشان ئەیفەرموو: (خودایە وەلیدی کوڕی وەلیدو سەلەمەی هیشامو غەیاسی کوڕی ئەبورەبیعەو باوەڕدارە چەسپاوەکان ڕزگار بکە. ئەی خودایە تۆڵەت قورس بکە لەسەر هۆزی موزەڕ و ساڵەکانیان بکە بە ساڵە گرانیەکانی یوسوف) بە دەنگی بەرز ئەم دوعای دەکرد. وە لە هەندێ لە نوێژەکانی بەیانیدا ئەیفەرموو: (خودایە نەفرین بکە لە فلان و فلان) وە نەفرینی لە هەندێ ناوچە لە ناوچەکانی عەرەب دەکرد. هەتا خودا ئەم ئایەتەی نارد: ﴿لَيْسَ لَكَ مِنَ الْأَمْرِ شَيْءٌ﴾[4] بوخاری دەڵێت: لە حەمیدو سابتەوە، لە ئەنەسی کوڕی مالیکەوە وتی: پێغەمبەر (ﷺ) سەری شکا لە ڕۆژی ئوحودا فەرمووی: (چۆن گەلێ ڕزگار دەبێ کە سەری پێغەمبەرەکەیان شکاندبێ؟) ئەم ئایەتە هاتە خوارەوە: ﴿لَيْسَ لَكَ مِنَ الْأَمْرِ شَيْءٌ﴾[5] ئیمامی ئەحمەد ڕیوایەتی کردووە لە ئەنەسەوە (ڕەزای خوای لێ بێت) کە پێغەمبەر (ﷺ) یەکێ لە (چوارینەی) پێشەوەی شکێنرا لە ڕۆژی ئوحودا. دەمو چاوی بریندار بوو هەتا خوێن بە نێوچاوانیا هاتە خوارەوەو فەرمووی: (چۆن

---

[1] فتح الباري (٧٣/٨).

[2] النسائي في الكبرى (٣١٤/٦)، فەرموودەیەکی سەحیحە.

[3] أحمد (٩٣/٢)، فەرموودەیەکی حەسەنی غەریبە.

[4] البخاري (٤٥٦٠).

[5] فتح الباري (٤٦٥/٧).

گەلێ پزگاریان دەبێ تا ئەمەیان بەسەر پێغەمبەرەکەیان هێنا، کە ئەو بانگی دەکردن بۆ لای پەروەردگاری گەورەیان؟) خودای گەورە ئەم ئایەتەی نارده خوارەوە: ﴿لَيْسَ لَكَ مِنَ الْأَمْرِ شَيْءٌ أَوْ يَتُوبَ عَلَيْهِمْ أَوْ يُعَذِّبَهُمْ فَإِنَّهُمْ ظَالِمُونَ﴾، موسلیمیش ڕیوایەتی کردووە.[1] پاشان خودای گەورە ئەفەرموێت: ﴿وَلِلَّهِ مَا فِي السَّمَاوَاتِ وَمَا فِي الْأَرْضِ يَغْفِرُ لِمَن يَشَاءُ وَيُعَذِّبُ مَن يَشَاءُ وَاللَّهُ غَفُورٌ رَّحِيمٌ﴾ هەرچی لەناو ئاسمانەکان‌و زەمیندایە، هی خودایە، مەیلی لە کێ بێ لێی دەبورێ‌و مەیلیشی لە کێ بێ ئازاری ئەدا، خۆی دەزانێ. خودا لە گوناه دەبورێ‌و دلۆڤانە. واتە: هەموو موڵك‌و بەندەی ئەون‌و کاربەدەستیانەو کەس ناتوانێ دەست بخاتە کاری‌و پرسیاری لێ ناکرێ، ئەو لە خەڵکی دەپرسێتەوە.

﴿يَا أَيُّهَا الَّذِينَ آمَنُوا لَا تَأْكُلُوا الرِّبَا أَضْعَافًا مُّضَاعَفَةً ۖ وَاتَّقُوا اللَّهَ لَعَلَّكُمْ تُفْلِحُونَ (١٣٠) وَاتَّقُوا النَّارَ الَّتِي أُعِدَّتْ لِلْكَافِرِينَ (١٣١) وَأَطِيعُوا اللَّهَ وَالرَّسُولَ لَعَلَّكُمْ تُرْحَمُونَ (١٣٢) ۞ وَسَارِعُوا إِلَىٰ مَغْفِرَةٍ مِّن رَّبِّكُمْ وَجَنَّةٍ عَرْضُهَا السَّمَاوَاتُ وَالْأَرْضُ أُعِدَّتْ لِلْمُتَّقِينَ (١٣٣) الَّذِينَ يُنفِقُونَ فِي السَّرَّاءِ وَالضَّرَّاءِ وَالْكَاظِمِينَ الْغَيْظَ وَالْعَافِينَ عَنِ النَّاسِ ۗ وَاللَّهُ يُحِبُّ الْمُحْسِنِينَ (١٣٤) وَالَّذِينَ إِذَا فَعَلُوا فَاحِشَةً أَوْ ظَلَمُوا أَنفُسَهُمْ ذَكَرُوا اللَّهَ فَاسْتَغْفَرُوا لِذُنُوبِهِمْ وَمَن يَغْفِرُ الذُّنُوبَ إِلَّا اللَّهُ وَلَمْ يُصِرُّوا عَلَىٰ مَا فَعَلُوا وَهُمْ يَعْلَمُونَ (١٣٥) أُولَٰئِكَ جَزَاؤُهُم مَّغْفِرَةٌ مِّن رَّبِّهِمْ وَجَنَّاتٌ تَجْرِي مِن تَحْتِهَا الْأَنْهَارُ خَالِدِينَ فِيهَا ۚ وَنِعْمَ أَجْرُ الْعَامِلِينَ (١٣٦)﴾

**قەدەغە کردنی هەموو سووخۆریەك**

خودای گەورە ئەفەرموێت: ﴿يَا أَيُّهَا الَّذِينَ آمَنُوا لَا تَأْكُلُوا الرِّبَا أَضْعَافًا مُّضَاعَفَةً ۖ وَاتَّقُوا اللَّهَ لَعَلَّكُمْ تُفْلِحُونَ﴾ ئەی کۆمەڵی خاوەن باوەڕان واز لە سوو خواردن بێنن‌و چین لەسەر چین وەری مەگرن‌و لە خوا بترسن بەڵکو ڕزگارتان بێ. خودای گەورە ڕێگری لە عەبدە خاوەن باوەڕەکانی دەکات کە مامەڵەی سوو لەناو یەکتریا واز لێ بێنن‌و چین لەسەر چین لەسەر یەکتری تازەی مەکەنەوە وەك لە چەرخی نەفامیدا کاتی دانەوەی قەرز بهاتایە دەیان وت: یان دەبێ قەرزەکە بدەیتەوە یان لەسەری زیاد دەکرێ‌و سوودی دەچێتە سەر. خۆ ئەگەر قەرزەکەی نەدایەتەوە ماوەکەی بۆ زیاد دەکراو سوودی زیادە دەخرایە سەری. بەم شێوەیە هەموو ساڵێ تازە دەکرایەوە. جار وا دەبوو ئەو قەرزە کەمە چەند جاری خۆی زیادی دەکرد. خودای گەورە فەرمانی دا بە عەبدە خاوەن باوەڕەکانی کە لە

[1] مسلم (١٧٩١).

خوا بترسن هەتا لە دنیاو لە قیامەتدا ڕزگاریان ببێ، پاشان هەڕەشەیان لێ دەکات بە ئاگر ئەگەر واز لە سووخۆری نەهێنن و ئەفەرموێت: ﴿وَاتَّقُوا النَّارَ الَّتِي أُعِدَّتْ لِلْكَافِرِينَ (١٣١) وَأَطِيعُوا اللَّهَ وَالرَّسُولَ لَعَلَّكُمْ تُرْحَمُونَ﴾ خۆشتان دوورە پەرێز بگرن لەو ئاگرەی کە ساز دراوە بۆ ئەوانەی خوانەناسن. بەرفەرمانی خوداو ئەم پێغەمبەرەش بن، بەڵکو بەر بەزەیی کەون.

### هاندان بۆ کاری چاکەو بەدەستهێنانی بەهەشت

پاشان خودای گەورە هانی خاوەن باوەڕان ئەدات کە هەوڵی چاکەکردن بدەن و پەلە بکەن بۆ خۆ لە خوا نزیک بونەوەو ئەفەرموێت: ﴿وَسَارِعُوا إِلَىٰ مَغْفِرَةٍ مِّن رَّبِّكُمْ وَجَنَّةٍ عَرْضُهَا السَّمَاوَاتُ وَالْأَرْضُ أُعِدَّتْ لِلْمُتَّقِينَ﴾ پەلە بکەن گەیشتن بە بەخشینی پەروەردگارتان و بەهەشتێ کە پانایییەکەی بە ئەندازەی ئاسمانەکان و زەمینەو ساز کراوە بۆ ئەوانەی لەخوا ترسن. واتە: چۆن ئاگر ساز کرا بۆ خوانەناسان ئاوایش بەهەشت ساز کراوە بۆ خاوەن باوەڕان. هەندێ دەڵێن مانای ئەم ئایەتە کە خودای گەورە ئەفەرموێت: ﴿عَرْضُهَا السَّمَاوَاتُ وَالْأَرْضُ﴾ پانیەکەی بە ئەندازەی ئاسمانەکان و زەمینە. ئاماژەیە بۆ فراوانی درێژیەکەی، وەك خودای گەورە باسی فەرشەکانی بەهەشت دەکات و ئەفەرموێت: ﴿بَطَائِنُهَا مِنْ إِسْتَبْرَقٍ﴾[1] ناوەخنەکەیان لە ئاورێشمی ئەستوورە واتە: دەبێ دەرو ڕەوکەشەکەی چۆن بێ؟ هەندێکی تر دەڵێن: درێژی و پانیەکەی وەك یەکە، چونکە گومەزێکە لە ژێر عەرشایە. هەرشتێ گومەزی هەبێ و خڕ بێ پانی وەك درێژی وایە. بەڵگەیش لەسەر ئەوە ئەم فەرموودە سەحیحەیە کە پێغەمبەری خودا (ﷺ) ئەفەرموێت: (ئەگەر داواتان لە خوا کرد، داوای فیردەوس بکەن، چونکە بەرزترین شوێنی بەهەشتەو ناوەڕاستی بەهەشتە، وە لەوێوە ڕووبارەکانی بەهەشت هەڵدەقوڵێن و سەقفەکەی عەرشی خودای بەخشندەیە).[2] ئەم ئایەتە وەك ئەو ئایەتە وایە لە سورەتی حەدیدایە کە خودای گەورە ئەفەرموێت: ﴿سَابِقُوا إِلَىٰ مَغْفِرَةٍ مِّن رَّبِّكُمْ وَجَنَّةٍ عَرْضُهَا كَعَرْضِ السَّمَاءِ وَالْأَرْضِ﴾[3] پێشبڕکێ بکەن بۆ بەخشینی پەروەردگارتان و ئەو بەهەشتەی کە پانایی بە ئەندازەی ئەم ئاسمان و زەمینەیە. بەزار ڕیوایەتی کردووە لە ئەبوهورەیرەوە، وتی: پیاوێ هات بۆ لای پێغەمبەری خودا (ﷺ) وتی: ئایا ئەم ئایەتەت دی کە ئەفەرموێت: ﴿وَجَنَّةٍ عَرْضُهَا السَّمَاوَاتُ وَالْأَرْضُ﴾ ئەی

---

[1] الرحمن (٥٤).

[2] فتح الباري (١٤/٦).

[3] الحديد (٢١).

ئاگر لەکوێ یە؟ فەرمووی: (ئایا شەو دەبینی کاتێ کە داهات، هەموو شتێ دادەپۆشێ ئایا ڕۆژ لە کوێ یە؟) وتی: لە هەر شوێنێ خوا مەیلی لێ بێت. فەرمووی: (هەر بەو شێوەیە ئاگریش لە هەر شوێنێ خوای گەورە مەیلی لێ بێت)[1] ئەمە دوو مانا هەڵدەگرێ: مانای یەکەم: کە ڕۆژ دێتو شەو نابینین مەرج نیە کە شەو لە شوێنێکی ترا نەبێ. هەرچەندە ئێمەش پێی نەزانین. ئاگریش هەر بەو شێوەیە ئاگریش خوا مەیلی لێ بێ لە کوێ بوو لەوێدا دەبێ. مانای دووهەم: کاتێ کە ڕۆژ ڕووی دنیا دادەپۆشێ لەو ڕووەوە بێگومان شەو دەکەوێتە ڕووەکەی تر، بەهەشتیش هەر بەو شێوەیە کە دەکەوێتە شوێنی هەرە بەرز (أعلی علیین) لەسەری ئاسمانەکانەوە لە ژێری عەرشو پانایەکەیدایە. وەك خودای گەورە ئەفەرموێت: ﴿كَعَرۡضِ ٱلسَّمَآءِ وَٱلۡأَرۡضِ﴾ ئاگریش لە شوێنی هەرە نزمدایە، ئەمە نابێتە دژایەتی لەنێوان بوونی بەهەشت کە پانتایەکەی بە ئەندازەی ئاسمانەکانو زەمینەو لە نێوان بوونی ئاگرا والله أعلم.

پاشان خودای گەورە وەسفی خەڵکی بەهەشت دەکاتو ئەفەرموێت: ﴿ٱلَّذِينَ يُنفِقُونَ فِي ٱلسَّرَّآءِ وَٱلضَّرَّآءِ﴾ ئەو کەسانەی لە خۆشیو ناخۆشیدا ماڵی خۆیان لە ڕێی خوادا دەبەخشن، واتە: لە تەنگانەو فەرحانەداو لە خۆشیو ناخۆشیداو لە کاتی تەندروستیو نەخۆشیو هەموو کاتێکی ژیانیاندا ماڵی خۆیان دەبەخشن. وەك خودای گەورە لە ئایەتێکی تردا ئەفەرموێت: ﴿ٱلَّذِينَ يُنفِقُونَ أَمۡوَٰلَهُم بِٱلَّيۡلِ وَٱلنَّهَارِ سِرّٗا وَعَلَانِيَةٗ﴾[2] ئەو کەسانەی ماڵی خۆیان دەبەخشن بە شەوو بە ڕۆژ بە نهێنیو بە ئاشکرا. واتە: هیچ شتێ سەرقاڵیان ناکات لە گوێڕایەڵی خوداو ماڵ بەخشینو چاکە لەگەڵ خوادا لە خزمانو کەسانی تر لە هەموو جۆرە دەسگیرۆیەك لەبەر ڕەزای خوا. پاشان ئەفەرموێت: ﴿وَٱلۡكَٰظِمِينَ ٱلۡغَيۡظَ وَٱلۡعَافِينَ عَنِ ٱلنَّاسِ﴾ ڕقی خۆیان دەخۆنەوەو لە مەردم چاوپۆشی دەکەن. واتە: کاتێ کە ڕقیان هەڵسا، ڕقەکەیان دەخۆنەوەو دەری ناخەنو پێی هەڵناسن، لەگەڵ ئەویشا چاوپۆشی دەکەن لەوەی کە خراپەیان دەربارە دەکات. ئیمامی ئەحمەد ڕیوایەتی کردووە لە ئەبوهورەیرەوە (ڕەزای خوایان لێ بێت) لە پێغەمبەرەوە (ﷺ) کە فەرموویەتی: (ئازاییو بەهێزی بە پاڵەوان بازی نیە بەڵکو ئازاو بەهێز ئەو کەسەیە کە لە کاتی توڕەبوندا دان بە خۆیدا بگرێت)[3] بوخاریو موسلیمیش ڕیوایەتیان کردووە[4] ئیمامی ئەحمەد ڕیوایەتی کردووە لە ئیبنوعەبباسەوە

[1] کشف الأستار (٣/٤٣).

[2] البقرة (٢٧٤).

[3] أحمد (٢/٢٣٦)، فەرموودەیەکی سەحیحە.

[4] فتح الباري (١٠/٥٣٥)، مسلم ( (٢٠١٤).

(ڕەزای خوایان لێ بێت) وتی: پێغەمبەری خودا (ﷺ) فەرموویەتی: (هەرکەسێ چاوەڕوانی لە لێقەوماوێ بکات یان بیبەخشێ. خودای گەورە لە گەرمای توندی جەهەنم دەیپارێزێ. ئەوسا بزانن بێگومان کاری بەهەشت کۆکراوەتەوە بە تەپۆڵکەیەکەوە(سێ جار فەرمووی)، وە بزانن کاری ئاگریش سووك و کەم تاپۆیە. بەختەوەر ئەو کەسەیە خۆی لە تاقی کردنەوە پاراستوە. هیچ خۆ خواردنەوەیەك نیە لە لای خوا خۆشەویستتر بێ، لەو خۆخواردنەوە ڕقە کە عەبدەکەی دەیخواتەوە. هیچ عەبدێ لەبەر خودا ڕقەکەی ناخواتەوە مەگین خودا ناوی پڕ کردووە لە باوەڕ)[1] تەنیا ئەحمەد خۆی هێناویەتی، سەنەدو مەتنیەکەی حەسەنی. دیسان ئیمامی ئەحمەد ڕیوایەتی کردووە لە سەهلی کوڕی مەعازی کوڕی ئەنەسەوە، لە باوکیەوە کە پێغەمبەری خودا (ﷺ) فەرموویەتی: (هەرکەسێ ڕقێکی بخواتەوە. وە ئەو کەسە بتوانێ ڕقەکەی جێبەجێ بکات لەناو ئەو عەموو خەلکەدا خودا بانگی دەکات و سەرپشکی دەکات کام کیژی سپی چاوڕەشی خەرلمییە هەلدەبژێرێ) ئەبوداوودو تیرمیزیو ئیبنوماجەیش ڕیوایەتیان کردووە[2] تیرمیزی وتی: فەرموودەیەکی حەسەنی غەریبە. ئیبنومەردەوەیهی ڕیوایەتی کردووە لە ئیبنوعومەرەوە (ڕەزای خوایان لێ بێت) وتی: (هیچ قوتدانەوەیەك (خۆ خواردنەوە) نیە کە عەبد قوتی بداتەوە پاداشتی چاکتر بێ لە خواردنەوەی ڕقێك کە قوتی دابێتەوە لەبەر ڕەزای خوا)[3] ئیبنوجەریرو ئیبنوماجەیش ڕیوایەتیان کردووە[4] ﴿وَٱلۡكَٰظِمِينَ ٱلۡغَيۡظَ﴾ ڕقی خۆیان دەخۆنەوە. واتە: ڕقەکەیان بەسەر خەلکا بەکارناهێنن، بەلکو خۆیان لە شەڕیان لائەدەن بەهیوای وەرگرتنی پاداشتی خودان لەسەری. ﴿وَٱلۡعَافِينَ عَنِ ٱلنَّاسِ﴾ چاوپۆشی لە خەلکی دەکەن. لەگەلّ خۆ لادان لە شەڕ بە دلّ لەو خەلکانەش خۆش دەبن کە ناهەقیان لەگەلا کردوون و هیچ لە دلّیانا نیە بەرانبەر بەکەس، ئەمە چاکترین حالّەتە بۆ مرۆڤ. بۆیە خودای گەورە ئەفەرموێت: ﴿وَٱللَّهُ يُحِبُّ ٱلۡمُحۡسِنِينَ﴾ خودا چاکەکارانی خۆش دەوێ. ئەمە لە پلە باشەکانی چاکەیە. لەم فەرموودەدا هاتوە: (سێ شت هەن سوێندیان لەسەر دەخۆم: هیچ مالّێ بە خێر لێ کردن کەمی نەکردووە، خودا زیادی نەکردووە بۆ هیچ عەبدێك بە لێبوردن جگە لە سەربەرزی، هەرکەسیش لەبەر ڕەزای خوا خی بە کەم زانیبێ خودا بەرزی کردۆتەوە)[5]، پاشان خودای گەورە ئەفەرموێت: ﴿وَٱلَّذِينَ إِذَا فَعَلُواْ فَٰحِشَةً أَوۡ

---

[1] أحمد (٣٢٧/١)، سەنەدەکەی لاوازە.

[2] أحمد (٤٣٨/٣–٤٤٠)، أبوداود (١٣٧/٥)، تحفة الاحوذي (١٣٩/٦)، إبن ماجة (١٤٠٠/٢)، سەنەدەکەی لاوازە.

[3] أحمد (١٢٨/٢)، فەرمودەیەکی مودەلەسە.

[4] إبن ماجة (١٤٠١/٢)، فەرمودەیەکی مودەلەسە.

[5] أحمد (٢٣١/٤)، تیرمیزی دەلێ: فەرمودەیەکی حەسەنی سەحیحە.

ﻇَﻠَﻤُﻮٓﺍْ ﺃَﻧﻔُﺴَﻬُﻢۡ ﺫَﻛَﺮُﻭﺍْ ﭐﻟﻠَّﻪَ ﻓَﭑﺳۡﺘَﻐۡﻔَﺮُﻭﺍْ ﻟِﺬُﻧُﻮﺑِﻬِﻢۡ﴾ ئەو كەسانەی كاتێ كاری خراپ دەكەن، یان ناهەقی لە خۆیان دەكەن، كە یادی خودایان كردووە لەبەری دەپاڕێنەوە كە لە خراپەكانیان خۆش بێ. واتە: كاتێ كە تاوانێكیان كرد یەكسەر بەدوایدا تەوبە دەكەن‌و داوای لێبوردن لە خودا دەكەن. ئیمامی ئەحمەد ڕیوایەتی كردووە لە ئەبوهورەیرەوە (ڕەزای خوای لێ بێت) لە پێغەمبەری خوداوە كە فەرموویەتی: (پیاوێ گوناهێكی كرد پاشان وتی: پەروەردگارم گوناهێكم كردووە لە گوناهەكەم خۆش ببە. خودای گەورەش فەرمووی: بەندەكەم گوناهێكی كرد زانی كە پەروەردگاریەكی هەیە لە گوناه خۆش دەبێ‌و لەسەر گوناه سزا ئەدات. ئەوا منیش لە بەندەكەم خۆش بووم. پاشان گوناهێكی تری كرد، وتی: پەروەردگارم من گوناهێكم كردووە لە گوناهەكەم خۆش ببە، خودای گەورە فەرمووی: بەندەكەم گوناهێكی كرد زانی كە پەروەردگاریەكی هەیە لە گوناه خۆش دەبێ‌و لەسەر گوناه سزا ئەدات. ئەوا لە عەبدەكەم خۆش بووم. پاشان گوناهێكی تری كرد، وتی: پەروەردگارم من گوناهێكم كردووە، لە گوناهەكەم خۆش ببە، خودای گەورە فەرمووی: بەندەكەم گوناهێكی كرد زانی پەروەردگاریەكی هەیە لە گوناه خۆش دەبێ‌و لەسەر گوناه سزا ئەدات، ئەوا لە بەندەكەم خۆش بووم. پاشان گوناهێكی تری كرد، وتی: پەروەردگارم من گوناهێكم كردووە، لە گوناهەكەم خۆش ببە، خودای گەورە فەرمووی: بەندەكەم گوناهێكی كرد زانی پەروەردگاریەكی هەیە لە گوناه خۆش دەبێ‌و لەسەر گوناه سزا ئەدات. ئەوا لە بەندەكەم خۆش بووم. ئێوە دەكەم بە شایەت كە من لەم بەندەم خۆش بووم، هەرچی مەیلی لێیە با بیكات)[1] بوخاری‌و موسلیمیش ڕیوایەتیان كردووە[2] عەبدوڕەزاق ڕیوایەتی كردووە لە ئەنەسی كوڕی مالیكەوە (ڕەزای خوای لێ بێت) وتی: پێم گەیشتووە كاتێ كە شەیتان ئەم ئایەتە هاتوتە خوارەوە: ﴿وَﭐﻟَّﺬِﻳﻦَ ﺇِﺫَﺍ ﻓَﻌَﻠُﻮﺍْ ﻓَٰﺤِﺸَﺔً ﺃَﻭۡ ﻇَﻠَﻤُﻮٓﺍْ ﺃَﻧﻔُﺴَﻬُﻢۡ ﺫَﻛَﺮُﻭﺍْ ﭐﻟﻠَّﻪَ ﻓَﭑﺳۡﺘَﻐۡﻔَﺮُﻭﺍْ ﻟِﺬُﻧُﻮﺑِﻬِﻢۡ﴾ گریاوە[3] پاشان خودای گەورە ئەفەرموێت: ﴿وَﻣَﻦ ﻳَﻐۡﻔِﺮُ ﭐﻟﺬُّﻧُﻮﺏَ ﺇِﻟَّﺎ ﭐﻟﻠَّﻪُ﴾ جگە لە خودا كێ لە گوناهەكان دەبورێ؟ واتە: تەنیا خودا لە گوناه دەبورێ. ﴿وَﻟَﻢۡ ﻳُﺼِﺮُّﻭﺍْ ﻋَﻠَﻰٰ ﻣَﺎ ﻓَﻌَﻠُﻮﺍْ ﻭَﻫُﻢۡ ﻳَﻌۡﻠَﻤُﻮﻥَ﴾ وە ئەو كەسانە لەسەر كارێ كە زانیویانە هەڵەیە پێ داناگرن واتە: پەشیمان بونەتەوە لە گوناهەكانیان‌و بە زوویی گەڕانەتەوە بۆ لای خوداو بەردەوام نەبوون لەسەر گوناه بەڵام بە تەواویش وازیان لێ نەهێناوە و ئەگەر جارجارێ تووشی گوناه ببنەوە خێرا پەشیمان دەبنەوە.

---

[1] أحمد (٢/٢٩٦)، فەرموودەیەكی سەحیحە.

[2] فتح الباري (١٣/٤٧٤).

[3] عبدالرزاق (١/١٣٣).

موجاهیدو عەبدوڵلای کوڕی عەبەیدی کوڕی عومەیر دەڵێن: ﴿وَهُمۡ يَعۡلَمُونَ﴾ واتە: دەزانن هەرکەسێ تەوبەی کرد خودا تەوبەی لێ قبووڵ دەکات. ئەم ئایەتە وەك ئەو ئایەتە وایە کە خودای گەورە ئەفەرموێت: ﴿أَلَمۡ يَعۡلَمُوٓاْ أَنَّ ٱللَّهَ هُوَ يَقۡبَلُ ٱلتَّوۡبَةَ عَنۡ عِبَادِهِۦ﴾[1] چۆن دەبێ نەیانزانیبێ خودا تۆبە لە عەبدی خۆی قبووڵ دەکات. ئەم ئایەتەیش کە خودای گەورە ئەفەرموێت: ﴿وَمَن يَعۡمَلۡ سُوٓءًا أَوۡ يَظۡلِمۡ نَفۡسَهُۥ ثُمَّ يَسۡتَغۡفِرِ ٱللَّهَ يَجِدِ ٱللَّهَ غَفُورٗا رَّحِيمٗا﴾[2] هەرکەسێ کارێکی خراپ بکات، یان ناهەقیەك لە خۆی بکات پاشان لە خودا داوابکات کە ببیەخشێ، دەبینێ خودا لێبوردەو دلۆڤانە. لە شێوەی ئەم ئایەتانە لە قورئاندا زۆر هاتوە. ئیمامی ئەحمەد ڕیوایەتی کردووە لە عەبدوڵلای کوڕی عومەریرەوە، لە پێغەمبەرەوە (ﷺ) کە لەسەر دوانگە فەرموویەتی: (بە بەزەیی بن، بەزەیتان پێدا دێتەوە، لێبوردە بن، لێتان دەبورێ، هاوار بۆ ئەوانە کە دەبیسن و کاری پێ ناکەن. هاوار بۆ ئەوانەش پێ دادەگرن و بەردەوامن لەسەر ئەو کارانەی کە کردویانەو زانیویانە هەڵەیە)[3] تەنیا ئیمامی ئەحمەد خۆی هێناویەتی. پاشان خودای گەورە وەسفی ئەو کەسانە دەکات کە ئەو ڕەوشتانەیان تیایەو ئەفەرموێت:

﴿أُوْلَٰٓئِكَ جَزَآؤُهُم مَّغۡفِرَةٞ مِّن رَّبِّهِمۡ وَجَنَّٰتٞ تَجۡرِي مِن تَحۡتِهَا ٱلۡأَنۡهَٰرُ خَٰلِدِينَ فِيهَاۚ وَنِعۡمَ أَجۡرُ ٱلۡعَٰمِلِينَ﴾ ئەوانە پاداشتیان لەلای پەروەردگاریان لێبوردنەو باغاتێکە کە جۆباریان بەبەردا دەڕۆن و هە لەو باغاتە دەمێننەوە، بەه! چەندە جوانە پاداشتی ئاکارەکانیان.

﴿قَدۡ خَلَتۡ مِن قَبۡلِكُمۡ سُنَنٞ فَسِيرُواْ فِي ٱلۡأَرۡضِ فَٱنظُرُواْ كَيۡفَ كَانَ عَٰقِبَةُ ٱلۡمُكَذِّبِينَ ﴿١٣٧﴾ هَٰذَا بَيَانٞ لِّلنَّاسِ وَهُدٗى وَمَوۡعِظَةٞ لِّلۡمُتَّقِينَ ﴿١٣٨﴾ وَلَا تَهِنُواْ وَلَا تَحۡزَنُواْ وَأَنتُمُ ٱلۡأَعۡلَوۡنَ إِن كُنتُم مُّؤۡمِنِينَ ﴿١٣٩﴾ إِن يَمۡسَسۡكُمۡ قَرۡحٞ فَقَدۡ مَسَّ ٱلۡقَوۡمَ قَرۡحٞ مِّثۡلُهُۥۚ وَتِلۡكَ ٱلۡأَيَّامُ نُدَاوِلُهَا بَيۡنَ ٱلنَّاسِ وَلِيَعۡلَمَ ٱللَّهُ ٱلَّذِينَ ءَامَنُواْ وَيَتَّخِذَ مِنكُمۡ شُهَدَآءَۗ وَٱللَّهُ لَا يُحِبُّ ٱلظَّٰلِمِينَ ﴿١٤٠﴾ وَلِيُمَحِّصَ ٱللَّهُ ٱلَّذِينَ ءَامَنُواْ وَيَمۡحَقَ ٱلۡكَٰفِرِينَ ﴿١٤١﴾ أَمۡ حَسِبۡتُمۡ أَن تَدۡخُلُواْ ٱلۡجَنَّةَ وَلَمَّا يَعۡلَمِ ٱللَّهُ ٱلَّذِينَ جَٰهَدُواْ مِنكُمۡ وَيَعۡلَمَ ٱلصَّٰبِرِينَ ﴿١٤٢﴾ وَلَقَدۡ كُنتُمۡ تَمَنَّوۡنَ ٱلۡمَوۡتَ مِن قَبۡلِ أَن تَلۡقَوۡهُ فَقَدۡ رَأَيۡتُمُوهُ وَأَنتُمۡ تَنظُرُونَ ﴿١٤٣﴾﴾

---

[1] التوبة (١٠٤).

[2] النساء (١١٠).

[3] أحمد (١٦٥/٢)، پیاوەکانی جێی متمانەن.

**باسی حیکمەتی ئەوەی تووشیان هات لە ڕۆژی ئوحودا**

خودای گەورە ڕووی وتاری دەکاتە عەبدە خاوەن باوەڕەکانی، ئەوانەی لە ڕۆژی ئوحوددا تووشی ئەو تاقیکردنەوەیە هاتن و حەفتا کەسیان لێ شەهید بوو ئەفەرموێت: ﴿قَدْ خَلَتْ مِن قَبْلِكُمْ سُنَنٌ﴾ بەر لە ئێوە زۆر ڕێگاو شوێن تێپەڕ بوون. واتە: چەندین ڕووداو لەم چەشنە لە پێش ئێوەدا بەسەر گەلە پێشوەکاندا هات لە شوێن کەوتوی پێغەمبەرەکان، بەڵام لە دوایدا سەرکەوتن هەر بۆ ئەوان بوو، نوشوستی و سەرشۆڕیش هەر بۆ خوانەناسان. بۆیە خودای گەورە ئەفەرموێت: ﴿فَسِيرُوا فِي الْأَرْضِ فَانظُرُوا كَيْفَ كَانَ عَاقِبَةُ الْمُكَذِّبِينَ﴾ جا ئێوە لەم سەر زەمینە گەشتێ بکەن و سەرنج بدەن کە ئاخری کاری هەق بە درۆ زانان بە کوێ گەیشت؟. پاشان خودای گەورە ئەفەرموێت: ﴿هَٰذَا بَيَانٌ لِّلنَّاسِ﴾ ئەمە پەندی بۆ هەموو خەڵك تێدایە. واتە: ئەم قورئانە هەواڵی پێش ئێوەی تیایەو زۆر شتی تیا ڕوون کراوەتەوە دەربارەی گەلە پێشوەکان کە چۆن بوون بەرانبەر دوژمنەکانیان ﴿وَهُدًى وَمَوْعِظَةٌ لِّلْمُتَّقِينَ﴾ وە ڕێنموونی و ئامۆژگاریە بۆ لە خواترسان. پاشان خودای گەورە دڵنەوایی خاوەن باوەڕان دەکات و ئەفەرموێت: ﴿وَلَا تَهِنُوا وَلَا تَحْزَنُوا وَأَنتُمُ الْأَعْلَوْنَ إِن كُنتُم مُّؤْمِنِينَ﴾ با سستی ڕووتان تێ نەکات و خەمیش مەخۆن. هەر ئێوەن کە سەردەکەون، ئەگەر بڕواتان بە خودا هەیە. واتە: پاشەڕۆژ هەر بۆ ئێوەیەو بەهۆی ئەو ڕووداوەوە با کزی و لاوازی ڕووتان تێ نەکات. ﴿إِن يَمْسَسْكُمْ قَرْحٌ فَقَدْ مَسَّ الْقَوْمَ قَرْحٌ مِّثْلُهُ ۚ وَتِلْكَ الْأَيَّامُ نُدَاوِلُهَا بَيْنَ النَّاسِ﴾ ئەگەر ئێوە بریندار بوون، دوژمنیشتان وەك ئێوە بریندار بووە. ئێمە ئاوا لەناو خەڵکا زەمانە دەستاو دەس دەکەین. واتە: ئەگەر ئێوە لێتان بریندار بووەو کۆمەڵێکتان لێ شەهید بوە، دوژمنەکانیشتان هەر وەك ئێوە لێیان کوژراوەو بریندار بووە. بەڵام جارێکیش ئەوانمان داوە بەسەر ئێوەدا، بێگومان ئەوەی کردمان لە کارزانیمانەوەیە. بۆیە خودای گەورە ئەفەرموێت: ﴿وَلِيَعْلَمَ اللَّهُ الَّذِينَ آمَنُوا﴾ هەتا خاوەن باوەڕان بناسێ. ئیبنوعەبباس وتی: خودای گەورە دەیەوێ تا لەم شوێنانەدا خاوەن باوەڕان تاقی بکاتەوەو دەرکەوێ کێ خۆڕاگرەو ڕووبەڕووی دوژمن دەبێتەوە. ﴿وَيَتَّخِذَ مِنكُمْ شُهَدَاءَ ۗ وَاللَّهُ لَا يُحِبُّ الظَّالِمِينَ﴾ چەند کەسێکیش لە نێوانتاندا بە شەهید هەڵبژێرێ. خودا خۆشی لە ناهەقیکاران نایە. واتە: هەتا چەند کەسێ لە ڕێگەکەیدا شەهید بن و گیانی خۆیان لە پێناو ڕەزای خوادا ببەخشن. ﴿وَلِيُمَحِّصَ اللَّهُ الَّذِينَ آمَنُوا﴾ هەتا خودا خاوەن باوەڕان هەڵاوێرێ و لە تاوانەکانیان خۆش ببێ یان پلەیان بەرز بکاتەوە بەپێی ئەو

تاقیکردنەوەی کە تووشیان بووە. ﴿وَيَمۡحَقَ ٱلۡكَٰفِرِينَ﴾ بێ باوەڕانیش لەناوبەرێ. واتە: کاتێ کە خوانەناسان سەرکەوتنیان بەدەست هێنا یاخی دەبن دەست ئەدەنە خراپەکاریو لەخۆبایی دەبن، ئەو کارەیان دەبێتە هۆی قڕبوونو لەناوچوونو بنەبڕ بوونیان. پاشان خودای گەورە ئەفەرموێت: ﴿أَمۡ حَسِبۡتُمۡ أَن تَدۡخُلُواْ ٱلۡجَنَّةَ وَلَمَّا يَعۡلَمِ ٱللَّهُ ٱلَّذِينَ جَٰهَدُواْ مِنكُمۡ وَيَعۡلَمَ ٱلصَّٰبِرِينَ﴾ ئایا ئێوە لاتان وایە، هەروا سەریەخۆ دەچنە بەهەشت؟ کەچی هێشتا خودا خەباتکارانو خۆڕاگرانی ئێوەی دیاری نەکردووە. واتە: هێشتا خودا ئێوەی تاقی نەکردۆتەوە لە شەڕو کاتی زۆر تەنگانەدا. وەك خودای گەورە لە سورەتی بەقەرەدا ئەفەرموێت: ﴿أَمۡ حَسِبۡتُمۡ أَن تَدۡخُلُواْ ٱلۡجَنَّةَ وَلَمَّا يَأۡتِكُم مَّثَلُ ٱلَّذِينَ خَلَوۡاْ مِن قَبۡلِكُمۖ مَّسَّتۡهُمُ ٱلۡبَأۡسَآءُ وَٱلضَّرَّآءُ وَزُلۡزِلُواْ﴾[1] ئایا ئێوە لاتان وایە، هەروا دەچنە بەهەشت؟ کەچی هێشتا ئەوەی بەسەر پێشانتانا هاتووە، بەسەر ئێوەدا نەهاتووە، ئەوان تووشی گەلێ تەنگانەو ئازارو نەداریو چەوسانەوە بوون. وە ئەفەرموێت: ﴿الٓمٓ ۝١ أَحَسِبَ ٱلنَّاسُ أَن يُتۡرَكُوٓاْ أَن يَقُولُوٓاْ ءَامَنَّا وَهُمۡ لَا يُفۡتَنُونَ ۝٢ وَلَقَدۡ فَتَنَّا ٱلَّذِينَ مِن قَبۡلِهِمۡۖ فَلَيَعۡلَمَنَّ ٱللَّهُ ٱلَّذِينَ صَدَقُواْ وَلَيَعۡلَمَنَّ ٱلۡكَٰذِبِينَ﴾[2] ألیف، لام، میم، ئایا مەردم لایان وایە هەر کە بڵێن: ئێمە باوەڕمان هێناوە، ئیتر وازیان لێ دەهێنرێو تووشی هیچ تاقیکردنەوەیەك نابن؟ ئێمە ئەوانەی پێش ئەوانیشمان تاقی کردۆتەوە، بێگومانە خوا ئەوانەی کە ڕاستیان وت، ئەوانەیش کە درۆزنن دیاری دەکات. هەر بۆیە لێرەیشا خودای گەورە ئەفەرموێت: ﴿أَمۡ حَسِبۡتُمۡ أَن تَدۡخُلُواْ ٱلۡجَنَّةَ وَلَمَّا يَعۡلَمِ ٱللَّهُ ٱلَّذِينَ جَٰهَدُواْ مِنكُمۡ وَيَعۡلَمَ ٱلصَّٰبِرِينَ﴾ واتە: بەهەشت بەدەست ناهێنن هەتا تاقی نەکرێنەوەو خودا خەباتکارانو خۆڕاگران لە ڕێگەی خۆیدا دیاری نەکاتو ڕووبەڕووی دوژمنیان نەکاتەوە. پاشان خودای گەورە ئەفەرموێت: ﴿وَلَقَدۡ كُنتُمۡ تَمَنَّوۡنَ ٱلۡمَوۡتَ مِن قَبۡلِ أَن تَلۡقَوۡهُ فَقَدۡ رَأَيۡتُمُوهُ وَأَنتُمۡ تَنظُرُونَ﴾ بەر لەوەی تووشی مردن بن ئارەزووی مردنتان دەکرد، سا وا مەرگەو هاتوەو ئێوە بە چاوی خۆتان تەماشای دەکەن. واتە: ئەی خاوەن باوەڕان ئێوە لە پێش ئەمڕۆدا ئارەزووی ڕووبەڕووبونەوەی دوژمنتان دەکردو خۆتان بۆ دەخواردنەوەو حەزتان دەکرد زوو دەستتان پێیان بگاتو خۆتانیان لەگەڵا تاقی بکەنەوە، ئەوا ئێستا ئەوەی ئاواتتان بۆ دەخوازی هاتوەو لەبەر دەستتاندایە، دەسا شەڕ بکەنو خۆڕاگر بن. لە هەردووو سەحیحەکەدا هاتووە کە پێغەمبەری خودا (ﷺ) فەرموویەتی: (خۆزگە مەخوازن بۆ ڕووبەڕووبونەوەی دوژمن، داوا لە خوا بکەن سەلامەتو

[1] البقرة (٢١٤).

[2] العنکبوت (١-٣).

پارێزراو بن، ئەگەر ڕووبەڕووشیان بوونەوە خۆڕاگر بن. ئەوەیش بزانن کە بەهەشت لە ژێر سێبەری شەمشێرەکاندایە)[1] بۆیە خودای گەورە ئەفەرموێت: ﴿فَقَدْ رَأَيْتُمُوهُ﴾ بە چاوی خۆتان مردنتان بینی لە کاتی بریسکەی شمشێرو بەیەکداچوونی تیرەکان و ڕیزی جەنگاوەران لە شەڕدا. زانایانی (عیلمی کلام) بە خەیاڵ لێکی دەدەنەوە، بینینێکە بە هەست نیە، بەلام وەك ئەوە وایە کە ببینی، وەك مەڕ چۆن هەست بە هاوڕێیەتی بەران دەکات و بە دوژمنایەتی گورگ.

﴿وَمَا مُحَمَّدٌ إِلَّا رَسُولٌ قَدْ خَلَتْ مِن قَبْلِهِ الرُّسُلُ أَفَإِن مَّاتَ أَوْ قُتِلَ انقَلَبْتُمْ عَلَىٰ أَعْقَابِكُمْ وَمَن يَنقَلِبْ عَلَىٰ عَقِبَيْهِ فَلَن يَضُرَّ اللَّهَ شَيْئًا وَسَيَجْزِي اللَّهُ الشَّاكِرِينَ (١٤٤) وَمَا كَانَ لِنَفْسٍ أَن تَمُوتَ إِلَّا بِإِذْنِ اللَّهِ كِتَابًا مُّؤَجَّلًا وَمَن يُرِدْ ثَوَابَ الدُّنْيَا نُؤْتِهِ مِنْهَا وَمَن يُرِدْ ثَوَابَ الْآخِرَةِ نُؤْتِهِ مِنْهَا وَسَنَجْزِي الشَّاكِرِينَ (١٤٥) وَكَأَيِّن مِّن نَّبِيٍّ قَاتَلَ مَعَهُ رِبِّيُّونَ كَثِيرٌ فَمَا وَهَنُوا لِمَا أَصَابَهُمْ فِي سَبِيلِ اللَّهِ وَمَا ضَعُفُوا وَمَا اسْتَكَانُوا وَاللَّهُ يُحِبُّ الصَّابِرِينَ (١٤٦) وَمَا كَانَ قَوْلَهُمْ إِلَّا أَن قَالُوا رَبَّنَا اغْفِرْ لَنَا ذُنُوبَنَا وَإِسْرَافَنَا فِي أَمْرِنَا وَثَبِّتْ أَقْدَامَنَا وَانصُرْنَا عَلَى الْقَوْمِ الْكَافِرِينَ (١٤٧) فَآتَاهُمُ اللَّهُ ثَوَابَ الدُّنْيَا وَحُسْنَ ثَوَابِ الْآخِرَةِ وَاللَّهُ يُحِبُّ الْمُحْسِنِينَ (١٤٨)﴾

**دەنگۆی کوژرانی پێغەمبەر (ﷺ) لە غەزای ئوحودا ڕوونکردنەوەی هەڵوێستی ڕێك و تەواو لە حاڵەتی مردنیدا**

کاتێ کە موسوڵمانەکان تووشی ئەو شکستیە هاتن لە ڕۆژی ئوحوداو ئەوەیش شەهید بوو لێیان کە شەهید بوو، شەیتان بانگەوازی کرد وتی: ئەوسا بزانن کە موحەممەد کوژراوە ئیبنوقەمیئە گەڕاوە بۆ لای بت پەرستەکان و پێی وتن: کە موحەممەدی کوشتوە. ئەو قسە کاریگەری کردە دڵی زۆر کەس، بڕوایان کرد کە پێغەمبەری خودا (ﷺ) کوژراوە. بە لایانەوە دروست بوو، وەك خودای گەورە باسی بەسەرهاتی زۆرێ لە پێغەمبەرانی کردبوو کە بەدەست گەلەکەیان کوژرا بوو. ئەو دەنگو باسە بووە هۆی کزی و لاوازی و سارد بونەوەی موسوڵمانان لە شەڕ کردن، ئا لەو کاتەدا خودای گەورە قورئانی ناردە خوارەوە بۆ پێغەمبەرەکەی و (ﷺ) فەرمووی: ﴿وَمَا مُحَمَّدٌ إِلَّا رَسُولٌ قَدْ خَلَتْ مِن قَبْلِهِ الرُّسُلُ﴾ موحەممەد(ﷺ) تەنیا پێغەمبەرێکە، لە پێش ئەویش زۆر پێغەمبەر هاتوون و چوون. واتە: موحەممەدیش هەر وەك یەکێك لەو پێغەمبەرانە وایە، چۆن ئەوان کوژران ئەمیش بۆی هەیە بکوژرێ، ئیبنوئەبی نەجیح وتی: لە باوکیەوە کە وتویەتی: پیاوێکی کۆچەری دەڕوات بە لای پیاوێکی ئەنساریدا، لەناو خوێنی خۆیدا کەوتبوو، پێی وت: ئەی فلان ئایا دەزانی موحەممەد (ﷺ) کوژراوە

[1] فتح الباري (٦/١٨١)، مسلم (٣/١٣٦٢).

ئەنساریەکە پێی وت: ئەگەر موحەممەد (ﷺ) کوژراوە، خۆ ئەو پەیامی خۆی گەیاند ئێوە شەڕ بکەن بۆ پارێزکاری لە ئاینەکەتدا. ئەم ئایەتە هاتە خوار کە ئەفەرموێت: ﴿وَمَا مُحَمَّدٌ إِلَّا رَسُولٌ قَدْ خَلَتْ مِن قَبْلِهِ ٱلرُّسُلُ﴾ بەیهەقی ڕیوایەتی کردووە لە(الدلائل النبوة)[1] پاشان خودای گەورە زەمی ئەو کزیو لاوازییەیان دەکات و ئەفەرموێت: ﴿أَفَإِيْن مَّاتَ أَوْ قُتِلَ ٱنقَلَبْتُمْ عَلَىٰٓ أَعْقَٰبِكُمْ ۚ وَمَن يَنقَلِبْ عَلَىٰ عَقِبَيْهِ فَلَن يَضُرَّ ٱللَّهَ شَيْـًٔا ۗ وَسَيَجْزِى ٱللَّهُ ٱلشَّٰكِرِينَ﴾ ئەگەر بمرێ یان بکوژرێ، لە ئیسلام پاشگەز دەبنەوە؟ هەرکەسیش پاشگەز ببێتەوە، زیان بە خوا ناگەیەنێ، خودا پاداشتی سوپاسگوزاران ئەداتەوە. واتە: ئەوانەی گوێڕایەڵی خودا دەکەن و لە پێناوی ئاینەکەیا شەڕ دەکەن و شوێنکەوتوی پێغەمبەرەکەین بە زیندوی بێ یان بە مردوویی، خودا پاداشتیان ئەداتەوە. وە لە کتێبە سەحیح و سونەن و موسنەدەکان و لە زۆر کتێبی تریشا هاتوە لە زۆر ڕێگاوەو وە لە هەردوو موسنەدەکەی ئەبوبەکرو عومەرا (ڕەزای خوایان لێ بێت) هاتووە، کە ئەبوبەکر (ڕەزای خوای لێ بێت) کاتێ پێغەمبەری خودا (ﷺ) کۆچی دوایی کرد ئەم ئایەتەی خوێند: ﴿وَمَا مُحَمَّدٌ إِلَّا رَسُولٌ قَدْ خَلَتْ مِن قَبْلِهِ ٱلرُّسُلُ ۚ أَفَإِيْن مَّاتَ أَوْ قُتِلَ ٱنقَلَبْتُمْ عَلَىٰٓ أَعْقَٰبِكُمْ ۚ وَمَن يَنقَلِبْ عَلَىٰ عَقِبَيْهِ فَلَن يَضُرَّ ٱللَّهَ شَيْـًٔا ۗ وَسَيَجْزِى ٱللَّهُ ٱلشَّٰكِرِينَ﴾ بوخاری ڕیوایەتی کردووە لە عائیشەوە (ڕەزای خوای لێ بێت) کە ئەبوبەکر بە سواری ئەسپێکەوە لە ماڵی خۆیەوە لە سونح (السُّنح) هات و دابەزی و چووە ناو مزگەوت و قسەی لەگەڵ کەسا نەکرد هەتا چووە لای عائیشە، پێغەمبەری خودا (ﷺ) کۆچی دوایی کردبوو بە پۆشاکێکی حەبیرەوە داپۆشرابوو، سەری لابردو دەمی بردو ماچی کردو گریا. پاشان وتی: دایک و باوکم بە قوربانت بێ، سوێند بە خوا دوو جار خودا تۆ نامرێنێ، وە ئەو مردنەیش کە لەسەرت نوسرا بوو تووشی هاتی، زوهری ڕیوایەتی کردووە لە ئیبنوعەبباسەوە وتی: ئەبوبەکر هاتە دەرەوە لە ماڵ، عومەر قسەی بۆ خەڵکی دەکرد، وتی: ئەی عومەر دانیشە عومەر دانەنیشت، خەڵکەکە ڕوویان لەم کردو وازیان لە عومەر هێنا، ئەبوبەکر وتی: أما بعد، هەرکەسێ موحەممەدی پەرستوە، بێگومان خودا زیندوەو نامرێ. خودای گەورە ئەفەرموێت: ﴿وَمَا مُحَمَّدٌ إِلَّا رَسُولٌ قَدْ خَلَتْ مِن قَبْلِهِ ٱلرُّسُلُ ۚ أَفَإِيْن مَّاتَ أَوْ قُتِلَ ٱنقَلَبْتُمْ عَلَىٰٓ أَعْقَٰبِكُمْ ۚ وَمَن يَنقَلِبْ عَلَىٰ عَقِبَيْهِ فَلَن يَضُرَّ ٱللَّهَ شَيْـًٔا ۗ وَسَيَجْزِى ٱللَّهُ ٱلشَّٰكِرِينَ﴾ دەڵێت: سوێند بە خوا وەک ئەوە کە ئەو خەڵکە نەیانزانیبێ ئەم ئایەتە هاتۆتە خوارەوە، هەتا ئەبوبەکر خوێندیەوە. هەموو خەڵکەکە لێیان وەرگرت و هەرکەسێ کە گوێی لێدەبوو دەیخوێندەوە. لە سەعیدی کوڕی موسەیبەوە

---

[1] دلائل النبوة (٣/٢٤٨).

وتی: عومەر وتی: سوێند بە خوا هەر ئەوەندە بوو کە گوێم لە ئەبوبەکر بوو ئایەتەکەی خوێندەوە هۆشم لە لای خۆم نەماو پێکانم ڕای نەگرتمو بەسەر زەویدا کەوتم.[1] خودای گەورە ئەفەرموێت: ﴿وَمَا كَانَ لِنَفْسٍ أَن تَمُوتَ إِلَّا بِإِذْنِ اللَّهِ كِتَٰبًا مُّؤَجَّلًا﴾ هیچ کەسێ بەبێ ئیزنی خوا نامرێ، وە مردنی هەرکەسێکیش کاتەکەی بۆ دانراوەو لەلای خوداوە نوسراوە. واتە: هیچ کەسێ نامرێ هەتا ئەو کاتەی خودا بۆی دیاری کردووەو تەواوی دەکات. کە تەواوی کرد بە فەرمانی خودا دەمرێت. بۆیە خودای گەورە فەرموویەتی: ﴿وَمَا كَانَ لِنَفْسٍ أَن تَمُوتَ إِلَّا بِإِذْنِ اللَّهِ كِتَٰبًا مُّؤَجَّلًا﴾ وەك ئەم ئایەتەیش کە خودای گەورە ئەفەرموێت: ﴿وَمَا يُعَمَّرُ مِن مُّعَمَّرٍ وَلَا يُنقَصُ مِنْ عُمُرِهِ إِلَّا فِي كِتَٰبٍ﴾[2] کێ تەمەنی درێژی دەبێو کێ تەمەنی کورتی دەبێ، مەگین لە کتێبێکا نوسراوە. وەك ئەم ئایەتەیش کە خودای گەورە ئەفەرموێت: ﴿هُوَ الَّذِي خَلَقَكُم مِّن طِينٍ ثُمَّ قَضَىٰ أَجَلًا وَأَجَلٌ مُّسَمًّى عِندَهُ﴾[3] ئەو خودایەی کە ئێوەی لە قوڕ دروست کردووەو ماوەی ژینی بۆ داناون، ئەو کاتەیش بڕیار داوەو ناوی ناوە (کە لە ژیان بێ بەش دەبن)، ئەم ئایەتە ترسەنۆکەکان هان ئەداو هەڵیان دەنێ بۆ شەڕ کردن، چونکە نە هوڵدان بۆ چوونە پێشەوەو نە خۆ دزینەوە لە شەڕ تەمەن زیادو کەم ناکات. وەك ئیبنوئەبی حاتەم ڕیوایەتی کردووە لە حەبیبی کوڕی سوهبانەوە وتی: پیاوێ لە موسوڵمانان کە موجری کوڕی عەدی بوو، وتی: چی بوەتە لەمپەر لە ڕێگەتاندا کە بپەڕنەوە بۆ ئەو دوژمنانە لەم ڕووباری دیجلەیەدا، خودای گەورە ئەفەرموێت: ﴿وَمَا كَانَ لِنَفْسٍ أَن تَمُوتَ إِلَّا بِإِذْنِ اللَّهِ كِتَٰبًا مُّؤَجَّلًا﴾ ئەسپەکەی دەخزاندە ناو دیجلە، کە ئەو وای کرد، هەموو خەڵکەکەی تریش نیشتنە ناو ڕووباری دیجلەوە، کاتێ کە دوژمن چاوی پێیان کەوت وتیان: ئەمانە دیوو دەنجن هەموو هەڵاتن.[4] پاشان خودای گەورە ئەفەرموێت: ﴿وَمَن يُرِدْ ثَوَابَ الدُّنْيَا نُؤْتِهِ مِنْهَا وَمَن يُرِدْ ثَوَابَ الْآخِرَةِ نُؤْتِهِ مِنْهَا وَسَنَجْزِي الشَّاكِرِينَ﴾ کێش هەر پاداشتی دنیای بوێ هەندێکی دەدەینێ، وە کێش پاداشتی ئەو دنیای بوێت هەر ئەیدەینێ، ئەوانەیش وا سوپاسگوزارن زوو پاداشتیان ئەدەینەوە. واتە: هەرکەسێ کاری بۆ دنیا کرد لەوەی خوا بڕیاری داوە بۆی پێی ئەدات، بەڵام لە ڕۆژی قیامەتدا بەشی نیە. هەرکەسیش مەبەستی خوا بێ لە کارەکەیدا خودا بەشی ئەدات لە ڕۆژی دواییدا لەگەڵ ئەویش کە لە دنیا بۆی داناوە. وەك خودای گەورە لە ئایەتی تردا

---

[1] فتح الباري (٧٥١/٧).

[2] فاطر (١١).

[3] الانعام (٢).

[4] إبن أبي حاتم (٥٨٤/٢).

ئەفەرموێت: ﴿ مَن كَانَ يُرِيدُ حَرْثَ ٱلْآخِرَةِ نَزِدْ لَهُۥ فِى حَرْثِهِۦ ۖ وَمَن كَانَ يُرِيدُ حَرْثَ ٱلدُّنْيَا نُؤْتِهِۦ مِنْهَا وَمَا لَهُۥ فِى ٱلْآخِرَةِ مِن نَّصِيبٍ ﴾[1] هەركەسێ داهاتی دوارۆژی بوێ، داهاتی پێ ئەدەین، كێش داهاتی لەم دنیادا بوێ، لەم دنیا بەشی ئەدەین‌و لەو دنیا بەشی نیە. وە ئەفەرموێت: ﴿مَّن كَانَ يُرِيدُ ٱلْعَاجِلَةَ عَجَّلْنَا لَهُۥ فِيهَا مَا نَشَآءُ لِمَن نُّرِيدُ ثُمَّ جَعَلْنَا لَهُۥ جَهَنَّمَ يَصْلَىٰهَا مَذْمُومًا مَّدْحُورًا ﴿١٨﴾ وَمَنْ أَرَادَ ٱلْآخِرَةَ وَسَعَىٰ لَهَا سَعْيَهَا وَهُوَ مُؤْمِنٌ فَأُو۟لَٰٓئِكَ كَانَ سَعْيُهُم مَّشْكُورًا ﴾[2] هەركەسێ خۆشی هەر لە دنیا دەوێ، ئەگەر ئێمە بمانەوێ ئاواتەكەی زوو پێك دێنین، پاشان بە ئابڕوو نەماوی‌و دەركراوی جەنەممان بۆ داناوەو دەیبرژێنێ. كێش خۆشی ئەو دنیای دەوێ‌و (بەپێی توانا) هەوڵی بۆ ئەداو خاوەن باوەڕە هەوڵەكەیان بەفیڕۆ ناچێ‌و لەبەرچاوەو وەرگیراوە. هەر بۆیە خودای گەورە لێرەدا ئەفەرموێت: ﴿وَسَنَجْزِى ٱلشَّٰكِرِينَ﴾ بەو زووانە پاداشتی سوپاسگوزاران ئەدەینەوە. واتە: لە دنیاو لە قیامەتدا لە چاكەو بەزەیی خۆمان بێ بەشی ناكەین بەپێی ئەو سوپاسگوزاری‌و چاكەیان. پاشان خودای گەورە دڵنەوایی بڕواداران دەكات‌و لەوەی بەسەریاندا هات لەو نارەحەتی‌و كوشتارە لە ڕۆژی ئوحوداو ئەفەرموێت: ﴿ وَكَأَيِّن مِّن نَّبِىٍّ قَٰتَلَ مَعَهُۥ رِبِّيُّونَ كَثِيرٌ ﴾ بەشی زۆر لە پێغەمبەران لەگەڵ ئەو خواناسانەی كە لەگەڵیان بوون چوونەتە غەزا هەندێ دەڵێن: واتە: زۆرێ لە پێغەمبەران‌و ئەو خواناسانەی لەگەڵیان بوون كوژران، ئیبنوجەریر ئەم ڕایەی هەڵبژاردوە. هەندێ تر دەڵێن: واتە: زۆرێ لە پێغەمبەران چەندین لە هاوەڵ‌و ئەو خواناسانەی لەگەڵ بوون لەلایدا كوژران. بەڵام ئیبنوئیسحاق لە سیرەتەكەیا قسەیەكی تر دەكات‌و دەڵێت: واتە: زۆرێ لە پێغەمبەران كوژراون‌و خواناسانیشیان لەگەڵا بووە. دوای پێغەمبەرەكانیان سستی‌و زەبوونی ڕووی تێ نەكردوون بەرانبەر دوژمنەكانیان وەستاون‌و غەزایان كردووەو بەركریان لە ئاینەكەیان كردووە. ئا ئەوە خۆڕاگریە ﴿وَٱللَّهُ يُحِبُّ ٱلصَّٰبِرِينَ﴾ خودا خۆڕاگرانی خۆش دەوێ. سوفیانی سەوری ڕیوایەتی كردووە لە ئیبنومەسعودەوە وتی: ﴿رِبِّيُّونَ كَثِيرٌ﴾ واتە: خواناسان بە هەزاران.[3] ئیبنوعەبباس‌و موجاهیدو سەعیدی كوڕی جوبەیرو عیكرمەو حەسەن‌و قەتادەو سوودی‌و ڕەبیع‌و عەتای خۆراسانی دەڵێن: (الربيون) واتە: كۆمەڵێكی زۆر[4] لە

---

[1] الشورى (٢٠).

[2] الاسراء (١٨-١٩).

[3] الطبري (٧/٢٦٦).

[4] إبن أبي حاتم (٢/٥٨٧-٥٨٨).

خواناسان. عەبدوڕەزاق وتی: لە موعەمەرو لە حەیەنەوە وتیان: ﴿وَمَا ضَعُفُوا﴾ واتە: زانایانی زۆر کە خۆڕاگرو چاكو لە خواترس بوون. ﴿وَمَا اسْتَكَانُوا﴾ سستی ڕووی تێ نەکردن بەهۆی ئەو بەڵانەی کە تووشیان هات لە ڕێی خوداو لاوازو زەبوون نەبوون. قەتادەو ڕەبیعی کوڕی ئەنەس وتیان: ﴿وَمَا ضَعُفُوا﴾ واتە: لاوازی ڕووی تێ نەکردن بە کوشتنی پێغەمبەرەکانیان[1] ﴿وَمَا اسْتَكَانُوا﴾ واتە: لە ڕێی خودا لایان نەداو لە ئاینەکەشیان پەشیمان نەبونەوە. شەڕیان کرد لەسەر ئەوەی کە پێغەمبەرەکەیان شەڕی لەسەر کرد هەتا گەڕانەوە بەر بارەگای خودای گەورە. ئیبنوعەبباس وتی: ﴿وَمَا اسْتَكَانُوا﴾ سەرشۆڕیان قبووڵ نەکرد. سوودیو ئیبنوزەید وتیان: ﴿وَمَا اسْتَكَانُوا﴾ زەلیلی ڕووی تێ نەکردن بەرانبەر دوژمنەکانیان. ﴿وَاللَّهُ يُحِبُّ الصَّابِرِينَ﴾ ئەوانەی خۆڕاگرن خودا خۆشی دەوێن. خودای گەورە ئەفەرموێت: ﴿وَمَا كَانَ قَوْلَهُمْ إِلَّا أَنْ قَالُوا رَبَّنَا اغْفِرْ لَنَا ذُنُوبَنَا وَإِسْرَافَنَا فِي أَمْرِنَا وَثَبِّتْ أَقْدَامَنَا وَانْصُرْنَا عَلَى الْقَوْمِ الْكَافِرِينَ ﴿١٤٧﴾ فَآتَاهُمُ اللَّهُ ثَوَابَ الدُّنْيَا وَحُسْنَ ثَوَابِ الْآخِرَةِ﴾ هەر ئەمە قسەی ئەوان بوو، کە دەیان وت: ئەی پەروەردگارمان تۆ لە گوناهانو لە ئەندازە لادانمان ببورەو جێ هەنگاوەکانمان بتەو کەو بەسەر خوانەناساندا زاڵمان بکە. ئەوسا خودا پاداشتی ئەم دنیاو چاکەو پاداشتی ئەو دنیاشی پێدان. واتە: هەر لە دنیادا خودا زاڵو سەرکەوتوی کردنو لە قیامەتیشا پاداشتی چاکی دانەوە ﴿وَاللَّهُ يُحِبُّ الْمُحْسِنِينَ﴾ خودا خۆڕاگرانی خۆش دەوێت.

﴿يَا أَيُّهَا الَّذِينَ آمَنُوا إِنْ تُطِيعُوا الَّذِينَ كَفَرُوا يَرُدُّوكُمْ عَلَىٰ أَعْقَابِكُمْ فَتَنْقَلِبُوا خَاسِرِينَ ﴿١٤٩﴾ بَلِ اللَّهُ مَوْلَاكُمْ ۖ وَهُوَ خَيْرُ النَّاصِرِينَ ﴿١٥٠﴾ سَنُلْقِي فِي قُلُوبِ الَّذِينَ كَفَرُوا الرُّعْبَ بِمَا أَشْرَكُوا بِاللَّهِ مَا لَمْ يُنَزِّلْ بِهِ سُلْطَانًا ۖ وَمَأْوَاهُمُ النَّارُ ۚ وَبِئْسَ مَثْوَى الظَّالِمِينَ ﴿١٥١﴾ وَلَقَدْ صَدَقَكُمُ اللَّهُ وَعْدَهُ إِذْ تَحُسُّونَهُمْ بِإِذْنِهِ ۖ حَتَّىٰ إِذَا فَشِلْتُمْ وَتَنَازَعْتُمْ فِي الْأَمْرِ وَعَصَيْتُمْ مِنْ بَعْدِ مَا أَرَاكُمْ مَا تُحِبُّونَ ۚ مِنْكُمْ مَنْ يُرِيدُ الدُّنْيَا وَمِنْكُمْ مَنْ يُرِيدُ الْآخِرَةَ ۚ ثُمَّ صَرَفَكُمْ عَنْهُمْ لِيَبْتَلِيَكُمْ ۖ وَلَقَدْ عَفَا عَنْكُمْ ۗ وَاللَّهُ ذُو فَضْلٍ عَلَى الْمُؤْمِنِينَ ﴿١٥٢﴾ ۞ إِذْ

---

[1] إبن أبي حاتم (٢/٥٩١).

تُصۡعِدُونَ وَلَا تَلۡوُۥنَ عَلَىٰٓ أَحَدٖ وَٱلرَّسُولُ يَدۡعُوكُمۡ فِيٓ أُخۡرَىٰكُمۡ فَأَثَٰبَكُمۡ غَمَّۢا بِغَمّٖ لِّكَيۡلَا تَحۡزَنُواْ عَلَىٰ مَا فَاتَكُمۡ وَلَا مَآ أَصَٰبَكُمۡۗ وَٱللَّهُ خَبِيرُۢ بِمَا تَعۡمَلُونَ ﴿١٥٣﴾﴾

**ڕێگری لە گوێڕایەڵی خوانەناسان و ڕوون کردنەوەی هۆکاری ئەوەی تووشیان هات لە سەرکەوتن و شکست هێنان**

خودای گەورە بەندە خاوەن باوەڕەکانی دەترسێنێ لە گوێڕایەڵی کردنی خوانەناس و دووڕووەکان. چونکە گوێڕایەڵی ئەوانە دەبێتە هۆی بەدبەختی دنیا و قیامەت، بۆیە خودای گەورە ئەفەرموێت: ﴿يَٰٓأَيُّهَا ٱلَّذِينَ ءَامَنُوٓاْ إِن تُطِيعُواْ ٱلَّذِينَ كَفَرُواْ يَرُدُّوكُمۡ عَلَىٰٓ أَعۡقَٰبِكُمۡ فَتَنقَلِبُواْ خَٰسِرِينَ﴾ ئەی کۆمەڵی خاوەن باوەڕان، ئەگەر ئێوە گوێڕایەڵی خوانەناسان بکەن، بەرەو دواوە دەتانگێڕنەوە و تووشی زیانباری دەبن. پاشان خودای گەورە فەرمان ئەدا بە خاوەن باوەڕان کە هەر گوێڕایەڵی ئەو بکەن و هەر ئەو بە گەورە و پشت و پەنای خۆیان بزانن و ئەفەرموێت: ﴿بَلِ ٱللَّهُ مَوۡلَىٰكُمۡۖ وَهُوَ خَيۡرُ ٱلنَّٰصِرِينَ﴾ بزانن گەورەی ئێوە هەر خودایە و ئەو چاکترین یاریدەدەرە. پاشان مژدەیان دەداتێ کە ترسی ئەوان دەخاتە دڵی دوژمنەکانیان و زەلیلیان دەکات بەهۆی ئەو خوانەناسیانەوە لەگەڵ ئەو سزاو جەزرەبەشا کە لە ڕۆژی قیامەتدا بۆی هەڵگرتوون و ئەفەرموێت: ﴿سَنُلۡقِي فِي قُلُوبِ ٱلَّذِينَ كَفَرُواْ ٱلرُّعۡبَ بِمَآ أَشۡرَكُواْ بِٱللَّهِ مَا لَمۡ يُنَزِّلۡ بِهِۦ سُلۡطَٰنٗاۖ وَمَأۡوَىٰهُمُ ٱلنَّارُۖ وَبِئۡسَ مَثۡوَى ٱلظَّٰلِمِينَ﴾ ئەوانەی خوانەناسن، چونکە بێ ئەوە بەڵگەیان لەسەرەوە بۆ هاتبێ هاوکار بۆ خودا دادەنێن، ترس دەخەینە دڵیان. شوێنیان ناو ئاگرە و جێی ستەمکاران خراپترین جێگە دەبێ. وە لە هەردوو سەحیحەکەدا هاتوە لە جابیری کوڕی عەبدوڵلاوە کە پێغەمبەری خودا (ﷺ) فەرموویەتی: (پێنج شتم پێدراوە بە هیچ پێغەمبەرێکی پێش خۆم نەدراوە، یارمەتی دراوم بە ترس ماوە مانگێ، زەویم بۆ کراوە بە مزگەوت و پاک و خاوێن کەرەوە و دەسکەوتم بۆ حەڵا کراوە و تکاکاریشم پێدراوە، پێغەمبەران (سەلامی خوایانی لێ بێت) ڕەوانە کراون بۆ هۆزەکانی خۆیان بە تایبەتی، من ڕەوانە کراوم بۆ هەموو خەڵکی).[1] خودای گەورە ئەفەرموێت: ﴿وَلَقَدۡ صَدَقَكُمُ ٱللَّهُ وَعۡدَهُۥٓ إِذۡ تَحُسُّونَهُم بِإِذۡنِهِۦۖ حَتَّىٰٓ إِذَا فَشِلۡتُمۡ﴾ خودا بەڵێنی بە ئێوە داو بەجێی هێنا ئەو کاتەی بە دەستوری خودا دەتان کوشتن واتە: خودا زاڵی کردن بەسەریاندا. ئیبنوجورەیج وتی:

[1] فتح الباري (٥١٩/١)، مسلم (٣٧٠/١).

ئیبنوعەبباس وتی: ﴿حَتَّىٰٓ إِذَا فَشِلۡتُمۡ﴾ مەبەست بە (الفشل) ترسە[1]، ﴿وَتَنَٰزَعۡتُمۡ فِي ٱلۡأَمۡرِ وَعَصَيۡتُم﴾ ئیتر کێشەتان لەناو خۆتان لێ پەیدا بوو، لە فەرمان سەرپێچیتان کرد. وەك لە نێوان تیرئەندازەکاندا ڕوویدا. ﴿مِّنۢ بَعۡدِ مَآ أَرَىٰكُم مَّا تُحِبُّونَ﴾ لە پاش ئەوەی کە خودا نیشانی دان ئەوەی کە پێتان خۆش بوو (کە سەرکەوتن لە سەرەتای جەنگەکەدا). ﴿مِنكُم مَّن يُرِيدُ ٱلدُّنۡيَا﴾ هی واتان هەبوو حەزی لە ماڵی دنیا بوو. کاتێ کە دوژمن تێشکا دەیویست تاڵانی کۆبکاتەوە ﴿وَمِنكُم مَّن يُرِيدُ ٱلۡأٓخِرَةَۚ ثُمَّ صَرَفَكُمۡ عَنۡهُمۡ لِيَبۡتَلِيَكُمۡ﴾ هی واش هەبوو خۆشی ئەو دنیایان دەویست پاشان خودا ئێوەی گێڕایەوە لە شەڕی ئەوان‌و (تێك شكان) هەتا تاقیتان بکاتەوە، ﴿وَلَقَدۡ عَفَا عَنكُمۡ﴾ خودا لێتان خۆش بوو. واتە: چوپۆشی لەو کارەتان کرد کە پێی هەڵسان ئەوەیش خودا خۆی باش دەزانێ لەبەر زۆری ژمارەی دوژمن‌و چەکی جەنگیانەوەو کەمی ژمارەی موسوڵمانان‌و کەمی چەك‌و کەرەسەی شەڕی موسوڵمانانەوە بوو. بوخاری ڕیوایەتی کردووە لە بەرائەوە (البراء) وتی: لەو ڕۆژەدا کە ڕووبەڕووی بت پەرستەکان بوینەوە، پێغەمبەری خودا لەشکرێکی لە تیرئەندازان دانا‌و عەبدوڵڵای کوڕی جوبەیری کردە لێپرسراویان‌و فەرمووی: (لێرە لانەچن، ئەگەر بینیتان سەرکەوتین بەسەریاندا شوێنەکەتان بەجێ مەهێڵن، وە ئەگەر دیتان سەرکەوتن بەسەرماندا هەر هاوکاریمان مەکەن) کاتێ ڕووبەڕوویان بوینەوە هەڵاتن، هەتا ژنەکانمان بینی بەرەو کێوەکە دەچوون بەپەلە‌و لاقیان بەرز دەکردەوەو خەڵخاڵەکانیان دەردەکەوت، تیرئەندازەکان دەیان وت: تاڵانی تاڵانی‌و دەسکەوت، عەبدوڵڵای کوڕی جوبەیر وتی: پێغەمبەر بەڵێنی لێ وەرگرتووم کە لێرە نەجوڵێن، بە گوێیان نەکرد، کاتێ کە بە گوێیان نەکردو ڕوویان وەرگێڕا، حەفتا کەسیان لێ کوژرا، ئەبوسوفیان هات‌و وتی: ئایا موحەممەد لەناو ئەو خەڵکەدایە؟ فەرمووی: وەڵامی مەدەنەوە، وتی: ئایا کوڕی ئەبوقوحافە لەناو ئەو خەڵکەدایە؟ فەرمووی: وەڵامی مەدەنەوە، پاشان وتی: کوڕی خەتاب لەناو ئەو خەڵکە دایە؟ پاشان وتی: ئەوانە بێگومان کوژراون، ئەگەر زیندوو بونایە وەڵامیان ئەدایەوە، عومەر خۆی پێ نەگیراو وتی: درۆت کرد ئەی دوژمنی خودا، خودا ئەوانەی هێشتۆتەوە بۆت هەتا داخ‌و کەسەرت پێ بخوات، ئەبوسوفیان وتی: هوبەل بڵند بە، پێغەمبەر (ﷺ) فەرمووی: (وەڵامی بدەنەوە)، وتیان چی بڵێین؟ فەرمووی: (بڵێن: خودا زۆر خاوەن شکۆو بڵندترە) ئەبوسوفیان وتی: ئێمە عوزامان هەیە، ئێوە عوزاتان نیە، پێغەمبەر (ﷺ) فەرمووی: (وەڵامی بدەنەوە) وتیان: چی بڵێین؟ فەرمووی: (بڵێن: خودا دۆستمانە، ئێوە دۆستتان نیە) ئەبوسوفیان وتی: ئەمڕۆ بە ڕۆژی بەدر

---

[1] الطبري (٧/٢٩١).

جەنگیش بە تۆبەیە. لاشەی شێواوتان دی من فەرمانم پێنەداوەو خراپەکەی مەخەنە سەر من[1] بوخاری خۆی تەنیا ئەم فەرمودەی بەم شێوەیە هێناوە. موحەممەدی کوڕی ئیسحاق ڕیوایەتی کردووە لە عەبدوڵلای کوڕی زوبەیرەوە کە زوبەیری کوڕی عەوام وتی: سوێند بە خوا من سەیری بەردەستەکانی هیندو هاوەڵەکانیم ئەکرد بە پەلە هەڵدەهاتن هیچ شتێکیان لەگەڵ خۆیان هەڵنەگرتبوو نە زۆر نە کەم، تیرئەندازەکان بەرەو لەشکرەکە کەوتنە ڕێ کاتێ ئەو خەڵکەیان بینی هەڵدێن بۆ تالانی کۆکردنەوە، پشتی ئێمەیان چۆڵ کرد بۆ سوارەکانی دوژمن و لە پشتەوە پلاماریان داین. یەکێ هاواری کردو وتی: ئەوسا بزانن موحەممەد کوژراوە. هورەمان نەماو ئەوانیش هەر بێ هورە بوون دوای ئەوەی خاوەن ئاڵاکانمان کوشتن، هەتا هیچ کەسێ لە دوژمن نەیدەتوانی لێمان نزیک بێتەوە. موحەممەدی کوڕی ئیسحاق وتی: ئاڵای بت پەرستەکان هەر لەوێدا کەوتبوو، هەتا ژنێك هەڵی گرت کە ناوی عەمرەی کچی عەلقەمەی حارسیە بوو دایەوە بە قورەیشیەکان و ورەیان وەبەرهاتەوە پێی. پاشان خودای گەورە ئەفەرموێت: ﴿ثُمَّ صَرَفَكُمْ عَنْهُمْ لِيَبْتَلِيَكُمْ﴾ پاشان هەتا تاقیتان بکاتەوە گێڕانیەوە لە شەڕیان. ئیبنوئیسحاق وتی: قاسمی کوڕی عەبدوڕەحمانی کوڕی ڕافیع کە پیاوێ بوو لە بەنی عەدی کوڕی نەجار بۆی گێڕامەوە وتی: ئەنەسی کوڕی نەزر مامەی ئەنەسی کوڕی مالیك گەیشتە لای عومەری کوڕی خەتاب و تەلحەی کوڕی عوبەیدالله لەگەڵ چەند کەسێك لە کۆچەری و ئەنسارەکان ئەوەی بە دەستیانەوە بوو دایان نابوو. وتی: نیازتان چیە؟ وتیان: پێغەمبەری خودا کوژراوە (ﷺ) وتی: جا ئێوە دوای ئەو ژیانتان بۆ چیە؟ هەڵسن با ئێوەیش لەسەر ئەوە بمرن کە ئەوی لەسەر مردوە، پاشان بەرەو دوژمن ڕۆشت و شەڕی کرد هەتا شەهید کرا (ڕەزای خوای لێ بێت)[2] بوخاری ڕیوایەتی کردووە لە ئەنەسی کوڕی مالیکەوە کە مامی ئەنەسی کوڕی نەزر لە ڕۆژی بەدرا ئامادە نەبوو. وتی: لە یەکەم جەنگی پێغەمبەرا (ﷺ) ئامادە نەبووم، ئەگەر خودا بۆی ڕەخساندم لەگەڵ پێغەمبەری خوادا (ﷺ) خودا خۆی دەزانێ چۆن دەبم، گەیشتە ڕۆژی ئوحود خەڵکی هەڵاتن وتی: خودایە پەنا دەگرم بە تۆ لەوەی ئەو موسوڵمانانە کردیان، وە خۆم بە دوور ئەگرم لەوەی کە بت پەرستان هێناویانە و دژیانم، بە شمشێرەکەیەوە پەلاماری داو گەیشتە سەعدی کوڕی مەعازو وتی: بۆ کوێ ئەی سەعد من بۆنی بەهەشت دێ بە ڕووما لەلای ئوحودەوە، ڕۆشت و شەهید کرا. نەدەناسرایەوە هەتا خوشکەکەی بە نیشانەو سەرپەنجەکانیا ناسیەوە زیاتر لە هەشتا زامی شمشێرو تیر بە لاشەیەوە بوو. ئەمە قسەی بوخاریە[3] موسلیمیش لە فەرموودەکەی سابیتی کوڕی ئەنەسەوە هەر بەم شێوەیە هێناویەتی[1] پاشان

---

[1] فتح الباري (٧/٤٠٥).

[2] إبن هشام (٣/٨٨).

[3] فتح الباري (٧/٤١١).

خودای گەورە ئەفەرموێت: ﴿وَلَقَدْ عَفَا عَنكُمْ وَاللَّهُ ذُو فَضْلٍ عَلَى الْمُؤْمِنِينَ﴾ وە لەو هەڵەیش لێتان خۆش بوو، خودا خاوەنی چاکەیە لەسەر خاوەن باوەڕان.

## باسی هەندێ لەو موسوڵمانانەی کە لە ڕۆژی ئوحودا تووشی شکاندن هاتن

خودای گەورە ئەفەرموێت: ﴿إِذْ تُصْعِدُونَ وَلَا تَلْوُونَ عَلَىٰ أَحَدٍ﴾ ئەو کاتەی کە ڕاتان کردو ئاوڕتان لەسەر هیچ کەس نەئەداوە. واتە: لە دوژمن وەری گەڕاندنو بەرەو کێوەکە ڕاتان کردو لە دوژمن هەڵاتن. حەسەنو قەتادە بە (تَصْدُون) خوێندویانەتەوە واتە: بەرەو کێوەکە ڕاتان دەکرد[2]، ﴿وَلَا تَلْوُونَ عَلَىٰ أَحَدٍ﴾ ئاوڕتان لە هیچ کەس نەئەداوە، لە ترسو بیمێکی وادا بوون. ﴿وَالرَّسُولُ يَدْعُوكُمْ فِي أُخْرَاكُمْ﴾ پێغەمبەریش (ﷺ) لە دواوە بانگی دەکردن کە لە پشتی ئێوەوە بوو، کە لە دوژمن ڕانەکەنو بگەڕێنەوەو پەلاماریان بدەن. سوودی وتی: کاتێ کە بت پەرستەکان زۆریان بە موسوڵمانەکان هێنا لە ئوحوداو شکاندیان هەندێ لە موسوڵمانەکان ڕایان کردووە بۆ ناو شاری مەدینە، هەندێکی تریشیان ڕوویان کردە سەر کەژەکەو چوونە لای بەردەکەو لەسەری وەستان، پێغەمبەری خودایش (ﷺ) خەڵکەکەی بانگ دەکرد: (وەرنەوە بۆ لای من ئەی عەبدەکانی خودا، وەرنەوە بۆ لای من ئەی عەبدەکانی خودا) خودای گەورە باسی سەرکەوتنی موسوڵمانەکانی کردووە کە ڕایان کردووەو بەرەو کێوەکە سەرکەوتوون. وە باسی بانگ کردنی پێغەمبەریشی هەر کردووە وەك فەرموویەتی: ﴿إِذْ تُصْعِدُونَ وَلَا تَلْوُونَ عَلَىٰ أَحَدٍ وَلَا تَلْوُونَ عَلَىٰ أَحَدٍ وَالرَّسُولُ يَدْعُوكُمْ فِي أُخْرَاكُمْ﴾[3] ئیبنوعەبباسو قەتادەو ڕەبیعو ئیبنوزەیدیش هەر وایان وتوە[4].

## بەرگری کردنی ئەنسارو کۆچەریەکان لە پێغەمبەری خودا (ﷺ)

بوخاری ڕیوایەت کردووە لە قەیسی کوڕی ئەبوحازمەوە وتی: دەستی تەلحەم بینی تووشی گۆجی هاتبوو پارێزگاری پێغەمبەری (ﷺ) پێدەکرد لە ڕۆژی ئوحودا[5] وە لە هەردوو سەحیحەکەدا هاتووە لە ئەبوعوسمانی نەهدیەوە وتی: کەس لەگەڵ پێغەمبەری خوادا (ﷺ) نەمایەوە لەو چەند ڕۆژەدا کە

---

[1] مسلم (١٥١٢/٣).

[2] إبن أبي حاتم (٦٠٩/٢).

[3] الطبري (٣٠١/٧).

[4] الطبري (٣٠٣/٧).

[5] فتح الباري (٤١٦/٧).

پێغەمبەر شەڕی تیا دەکردن. بێجگە لە تەلحەی کوڕی عەبدوڵلاو سەعد. ئەمە قسەی تەلحەو سەعدە[1] سەعیدی کوڕی موسەیب وتی: بیستم لە سەعدی کوڕی ئەبووەقاص دەیوت: پێغەمبەری خودا (ﷺ) تیردانەکەی لە ڕۆژی ئوحودا بۆ هەڵبژێرام‌و فەرمووی: (لێیان دە دایك‌و باوكم بە قوربانت بێ) بوخاری هێناویەتی[2] وە لە هەردوو سەحیحەکەدا لە سەعدی کوڕی ئەبووەقاسەوە هاتوە دیسان وتی: دوو پیاوم لە ڕۆژی ئوحودا لەلای ڕاست‌و لەلای چەپی پێغەمبەرەوە (ﷺ) بینی کە دوو بەرگی سپیان لەبەردا بوو لەباتی پێغەمبەر (ﷺ) شەڕێکی زۆر توندیان دەکرد، نە لە پێش ئەو ڕۆژەدا چاوم پێیان کەوتوە نە لە دوای ئەو ڕۆژە. واتە: جوبرەئیل‌و میکائیل بوون ئەو دوانە.[3] ئەبوئەسوەد وتی: لە عوروەی کوڕی زوبەیرەوە وتی: ئوبەیی ککوڕی خەلەف برای جومەح هەر لە مەککە سوێندی خواردبوو کە دەبێ پێغەمبەری خودا (ﷺ) بکوژێ. کاتێ هەواڵی سوێندەکەی گەیشتە پێغەمبەر (ﷺ) فەرمووی: (نەخێر، إنشاءالله من ئەو دەکوژم) کاتێ کە ڕۆژی ئوحود هات بە ئاسن دەمامکی پۆشیبوو دەیوت: ڕزگارم نەبێ ئەگەر موحەممەد لە دەستم ڕزگاری ببێ، پەلاماری پێغەمبەری خوای دا (ﷺ) ویستی پێغەمبەر (ﷺ) بکوژێ. مەسعەبی کوڕی عومەیر ڕووبەڕووی بوەوە، برای بەنی عەبدودار پێغەمبەر (ﷺ) خۆی بە تەنیا مایەوە. مەسعەب شەڕی لەگەلا دەکرد. بۆشایەکی لەنێوان قەڵغان‌و شمشێرەکەیا لەسەر شانی بەرچاو کەوت بەو حەربەی کە پێی بوو لێیدا لە ئەسپەکەی کەوتە خوارەوە بۆ سەر زەوی، خوێن لە جێی ئەو لێدانە دەرنەهات هاوەڵەکانی هاتن هەڵیان گرت وەك گا دەیبۆڕاند، پێیان وتی: چی وا نارەحەتی کردوی خۆ ئەوە ڕووکاوە؟ قسەکەی پێغەمبەری (ﷺ) بۆ گێڕانەوە کە فەرمووی: (بەڵکو من ئوبەیی دەکوژم) پاشان وتی: سوێند بەو کەسەی گیانی منی بەدەستە، ئا ئەوەی کە بەسەر من هاتووە، بەسەر خەڵکی مەجاز بێ شوێنێکی بازاڕ بووە لە چەرخی نەفامیدا (هەموویان ئەمردن.) مردو چوو بۆ ناو ئاگر ﴿فَسُحۡقٗا لِّأَصۡحَٰبِ ٱلسَّعِيرِ﴾[4] هەی لە ئازاردا نەمێنن ئەم هاوەڵانی جەهەنمە. مووسای کوڕی عوقبە لە کتێبی (مەغازی)یەکەیدا ڕیوایەتی کردووە لە زوهری‌و لە سەعیدی کوڕی موسەیبەوە بەم شێوەیە. وە لە هەردوو سەحیحەکەدا هاتووە لە سەهلی کوڕی سەعدەوە پرسیاری لە برینەکانی پێغەمبەر (ﷺ) لێ کرا. وتی: ڕووی پێغەمبەر (ﷺ) بریندار کرا (ڕوباعی) شکێنرا زرێو قەڵغانەکەی شکا بەسەریدا، فاتیمەی کچی پێغەمبەری خودا (ﷺ) خوێنەکەی دەشۆری عەلی بە قەڵغانەکەی ئاوی بەسەرا دەکرد، کاتێ فاتمە (ڕەزای خوای لێ بێت) بینی ئاوەکە

---

[1] البخاري (٤٠٦٠)، مسلم (٢٤١٤).

[2] البخاري (٤٠٥٥).

[3] البخاري (٤٠٥٤)، مسلم (٢٣٠٦).

[4] الملك (١١).

خوێنەکە زیاتر دەکات، پارچە حەسیرێکی هەلگرت‌و سوتاندی هەتا بوە خۆڵەکەوەو دای لە برینەکەو خوێنەکە وەستاوە. پاشان خودای گەورە ئەفەرموێت: ﴿فَأَثَـٰبَكُمْ غَمًّۢا بِغَمٍّ﴾ جا خوا پاداشتی خەمی هەر بە خەم دانەوە. ئیبنوجەریر وتی: وەك ئەم ئایەتەیش کە خودای گەورە ئەفەرموێت: ﴿وَلَأُصَلِّبَنَّكُمْ فِى جُذُوعِ ٱلنَّخْلِ﴾[1] بە کۆتەرەی دار خورمادا هەڵتان دەواسم. واتە: لەسەر کۆتەری دار خورما[2] ئیبنوعەبباس وتی: خەمی یەکەم بەهۆی تێکشکانەکەیانەوە بوو. وە لەو کاتەدا کە وترا پێغەمبەر (ﷺ) کوژراوە خەمی دووهەمیش ئەو کاتە بوو کە بت پەرستەکان لەسەر کێوەکەوە لای سەریان لێ گرتن‌و پێغەمبەر (ﷺ) فەرمووی: (ئەی خودایە ئەوانە بۆیان نیە سەرکەون بەسەرماندا) لە عەبدوڕەحمانی کوڕی عەوفەوە وتی: خەمی یەکەم بەهۆی تێکشکانەوە بوو، خەمی دووهەمیش کاتێ وترا: پێغەمبەر (ﷺ) کوژراوە. ئەمە بە لایانەوە لە تێکشکانەکە گەورە تر بوو، ئیبنو مەردەوەیهی ڕیوایەتی کردووە. موجاهیدو قەتادە وتیان: خەمی یەکەم بیستنی کوژرانی پێغەمبەر بوو (ﷺ) خەمی دووهەمیش ئەو کوشتن‌و برینداریە بوو کە تووشیان هات. سوودی وتی: خەمی یەکەم لەدەست چوونی ئەو سەرکەوتن‌و تالآنیە بوو. خەمی دووهەمیش سەرکەوتنی دوژمن بوو بەسەریاندا. خودای گەورە ئەفەرموێت: ﴿لِّكَيْلَا تَحْزَنُوا۟ عَلَىٰ مَا فَاتَكُمْ﴾ نەکا لەبەر ئەوەی وا لە دەستتان چووە و ﴿وَلَا مَآ أَصَـٰبَكُمْ﴾ وە لەوەی کە تووشتان بووە (لە کوژران‌و بریندار بوون) خەفەت بخۆن. ئەمە قسەی ئیبنوعەبباس‌و عەبدوڕەحمانی کوڕی عەوف‌و قەتادەو سوودیە[3] ﴿وَٱللَّهُ خَبِيرٌۢ بِمَا تَعْمَلُونَ﴾ خودا لەو کارانەی دەیکەن ئاگادارە پاك‌و بێ گەردی‌و سوپاس‌و ستایش بۆ ئەو خودایە کە هیچ پەرستراوێ نیە بێجگە لەو نەبێ.

﴿ثُمَّ أَنزَلَ عَلَيْكُم مِّنۢ بَعْدِ ٱلْغَمِّ أَمَنَةً نُّعَاسًا يَغْشَىٰ طَآئِفَةً مِّنكُمْ ۖ وَطَآئِفَةٌ قَدْ أَهَمَّتْهُمْ أَنفُسُهُمْ يَظُنُّونَ بِٱللَّهِ غَيْرَ ٱلْحَقِّ ظَنَّ ٱلْجَـٰهِلِيَّةِ ۖ يَقُولُونَ هَل لَّنَا مِنَ ٱلْأَمْرِ مِن شَىْءٍ ۗ قُلْ إِنَّ ٱلْأَمْرَ كُلَّهُۥ لِلَّهِ ۗ يُخْفُونَ فِىٓ أَنفُسِهِم مَّا لَا يُبْدُونَ لَكَ ۖ يَقُولُونَ لَوْ كَانَ لَنَا مِنَ ٱلْأَمْرِ شَىْءٌ مَّا قُتِلْنَا هَـٰهُنَا ۗ قُل لَّوْ كُنتُمْ فِى بُيُوتِكُمْ لَبَرَزَ ٱلَّذِينَ كُتِبَ عَلَيْهِمُ ٱلْقَتْلُ إِلَىٰ مَضَاجِعِهِمْ ۖ وَلِيَبْتَلِىَ ٱللَّهُ مَا فِى صُدُورِكُمْ وَلِيُمَحِّصَ مَا فِى قُلُوبِكُمْ ۗ وَٱللَّهُ عَلِيمٌۢ بِذَاتِ

---

[1] طه (٧١).

[2] الطبري (٧/٣٠٤).

[3] إبن أبي حاتم (٢/٦١٣).

ٱلصُّدُورِ ﴿١٥٤﴾ إِنَّ ٱلَّذِينَ تَوَلَّوْا۟ مِنكُمْ يَوْمَ ٱلْتَقَى ٱلْجَمْعَانِ إِنَّمَا ٱسْتَزَلَّهُمُ ٱلشَّيْطَٰنُ بِبَعْضِ مَا كَسَبُوا۟ وَلَقَدْ عَفَا ٱللَّهُ عَنْهُمْ إِنَّ ٱللَّهَ غَفُورٌ حَلِيمٌ ﴿١٥٥﴾﴾

**دابەزینی ئارامی، کە خەو لێ کەوتن بوو لە کاتی غەزاکەدا بەسەر خاوەن باوەڕاندا و باسی ترس و دڵە ڕاوکەی دووڕووەکان**

خودای گەورە باسی منەتی خۆی دەکات بەسەر بەندەکانیەوە کە ئەو ئارامی و دڵنیایەی بۆ ناردن، کە بریتی بوو لە خەوێك کە بەسەریدا هێنان و خەریك بوو چەکەکانیان لە دەست دەکەوتە خوار لە خەمو خەفەتا، خەولێکەوتنیش لە کاتێکی وادا نیشانەی ئارامی و هێمنیە وەك خودای گەورە لە سورەتی ئەنفالدا فەرموویەتی لە بەسەرهاتی بەدرا ﴿ إِذْ يُغَشِّيكُمُ ٱلنُّعَاسَ أَمَنَةً مِّنْهُ ﴾[1] ئەو کاتەشتان هەر لە بیر بێ وا ئەو سوکە خەوەی لەلای خۆیەوە بۆ ناردن. بوخاری ڕیوایەتی کردووە لە ئەنەسەوە لە ئەبوتەلحەوە وتی: من یەکێك بووم لەو کەسانەی کە ئەو سووکە خەوەی گرت لە ڕۆژی ئوحودا هەتا شمشێرەکەم لە دەستم کەوتە خوارەوە چەند جارێ، لە دەستم دەکەوت هەڵم دەگرتەوە لە دەستم دەکەوت و هەڵم دەگرتەوە[2] لە کتێبی مەغازەکەیداو بە موعەلەقی و لە کتێبی تەفسیرەکەیدا سەنەدەکانی ڕیوایەت کردووە[3] تیرمیزی و نەسائی و حاکیم ڕیوایەتیان کردووە لە ئەنەسەوە لە ئەبوتەلحەوە وتی: لە ڕۆژی ئوحودا سەرم بەرز کردەوە و سەیرم ئەکرد هیچ کەسێ نەبوو لەو ڕۆژەدا لە ژێر قەڵغانەکەیدا. سووکە خەوی نەگرتبێ، ئەمە قسەی تیرمیزیە و وتی: فەرموودەیەکی حەسەنی سەحیحە[4] نەسائیش ڕیوایەتی کردووە دیسان وتی: ئەبوتەلحە وتی: من یەکێك بووم لەو کەسانەی کە ئەو خەوە سووکە گرتی[5]. وتی: دەستەیەکی تر لە دووڕووەکان بوون هەر خەفەتی خۆیان بوو، زۆر ترسەنۆك دوور لە هەق بوون وەك خودای گەورە ئەفەرموێت: ﴿ثُمَّ أَنزَلَ عَلَيْكُم مِّنۢ بَعْدِ ٱلْغَمِّ أَمَنَةً نُّعَاسًا يَغْشَىٰ طَآئِفَةً مِّنكُمْ وَطَآئِفَةٌ قَدْ أَهَمَّتْهُمْ أَنفُسُهُمْ يَظُنُّونَ بِٱللَّهِ غَيْرَ ٱلْحَقِّ ظَنَّ ٱلْجَٰهِلِيَّةِ ﴾ پاش ئەو خەمە ئارامیەکی ناردە سەرتان، کە بریتی بوو لە ئۆقرەی خەو لێ کەوتن بەسەر هەندێکتانداو هەندێکیشتان هەر تەنیا خۆتان لەبیر بوو، ئێوەش هەر وەك خوانەناسەکانی پێشین بیرتان لە خوا دەکردەوە. ئەوانەی کە درۆزن بوون، هەر لە گومان و دڵەڕاوکەدا بوون دەربارەی خودا، بەڵام خاوەن

---

[1] الانفال (١١).

[2] فتح الباري (٧/٢٢).

[3] فتح الباري (٨/٧٦)، تحفة الاحوذي (٨/٣٥٨).

[4] تحفة الاحوذي (٨/٣٥٨)، النسائي في الكبرى (٦/٣٤٩)، الحاكم (٢/٢٩٧)، سەحیحە.

[5] النسائي في الكبرى (٦/٣٤٩)، سەحیحە.

باوەڕان ئەوانەی کە باوەڕێکی زۆر بتەوو دامەزراویان هەبوو، بڕوایان وابوو کە خودا بەو زوانە پێغەمبەرەکەی (ﷺ) سەردەخاتو بەڵێنەکانی خۆی دێنێتە دی بۆی. بەڵام ئەوانەی کە دووڕوو بوونو خەویان لێ نەکەوت لە ترسو دڵەڕاوکەدا دەژیان. ﴿يَظُنُّونَ بِٱللَّهِ غَيْرَ ٱلْحَقِّ ظَنَّ ٱلْجَٰهِلِيَّةِ﴾ وەك خودای گەورە لە ئایەتێکی تردا فەرموویەتی: ﴿بَلْ ظَنَنتُمْ أَن لَّن يَنقَلِبَ ٱلرَّسُولُ وَٱلْمُؤْمِنُونَ إِلَىٰٓ أَهْلِيهِمْ أَبَدًا﴾[1] نەخێر ئێوە پێتان وابوو پێغەمبەرو باوەڕداران هەرگیز تازە نایەنەوە ناو ماڵو خێزانی خۆیان. هەتا کۆتایی ئایەتەکە، هەر بەو شێوەیە دووڕووەکان بڕوایان وابوو کە بت پەرستەکان کە ئەو سەرکەوتنەیان لەو کاتەدا بەدەست هێناوە، ئیتر تەواو جارێکی تر ئیسلام سەر هەڵناداتەوەو هەموو لەناو دەچن. ئەمە بیرو بۆچوونی ئەو کەسانەیە کە لە گومانو دوودڵیدا ژیان بەسەر دەبەن، کاتێ کە تووشی کارێکی گرانو پڕ تەنگو چەڵەمە بوون، ئەم بیرو بۆچوونانەیان دەرئەکەوێو ئاشکرا دەبن. پاشان خودای گەورە باسیان دەکاتو ئەفەرموێت: ﴿يَقُولُونَ هَل لَّنَا مِنَ ٱلْأَمْرِ مِن شَيْءٍ﴾ دەڵێن: ئاخۆ لەم کارەدا چیمان بۆ دەکرێ؟ خودای گەورەیش ئەفەرموێت: ﴿قُلْ إِنَّ ٱلْأَمْرَ كُلَّهُۥ لِلَّهِ ۗ يُخْفُونَ فِىٓ أَنفُسِهِم مَّا لَا يُبْدُونَ لَكَ﴾ بلێ: گشت کاریەدەسی خودان، ئەوانە نهێنی دڵیان لەلای تۆ ئاشکرا ناکەن، پاشان خودای گەورە نیازی دڵیان دەردەخاو ئەفەرموێت: ﴿يَقُولُونَ لَوْ كَانَ لَنَا مِنَ ٱلْأَمْرِ شَيْءٌ مَّا قُتِلْنَا هَٰهُنَا﴾ دەڵێن: ئەگەر بە دەس خۆمان بوایە ئێمە لێرە نەدەکوژراین. واتە: ئەو قسانەیان لە پێغەمبەری خودا (ﷺ) دەشاردەوە. ئیبنوئیسحاق ڕیوایەتی کردووە لە عەبدوڵلای کوڕی زوبەیرەوە وتی: زوبەیر وتی: بێگومان چاوتان بە من بکەوتایە لەگەڵ پێغەمبەری خوادا (ﷺ) کاتێ کە ترسەکە زۆری هێنا پێمان، خودا سوکە خەوێکی هێنا بە سەرماندا. هیچ کەسێ لە هێمە نەما کە چەناکەی نەکەوێتە سەر سنگی، وتی: سوێند بە خوا من گوێم لە قسەی موتعەبی قوشەیر بوو وەك خەو ببینم گوێم لێ بوو دەیوت: ئەگەر بە دەستی خۆمان بوایە ئێمە لێرەدا نەدەکوژراین. ئەو قسەیەم لە ئەوەوە لەبەر کردو وەرم گرت لەسەر ئەوە خودا ئەم ئایەتەی ناردە خوارەوە: ﴿يَقُولُونَ لَوْ كَانَ لَنَا مِنَ ٱلْأَمْرِ شَيْءٌ مَّا قُتِلْنَا هَٰهُنَا﴾ لەسەر قسەکەی موتعەب هاتە خوارەوە[2]. ئیبنوئەبی حاتەم ڕیوایەتی کردووە. خودای گەورە ئەفەرموێت: ﴿قُل لَّوْ كُنتُمْ فِى بُيُوتِكُمْ لَبَرَزَ ٱلَّذِينَ كُتِبَ عَلَيْهِمُ ٱلْقَتْلُ إِلَىٰ مَضَاجِعِهِمْ﴾ بلێ: ئێوە ئەگەر لە ماڵی خۆشتان یان ئەو کەسانەی کە کوشتنیان لەسەر نوسراوە، دەهاتنەوە جێی

---

[1] الفتح (١٢).

[2] إبن أبي حاتم (٢/٦٢٠).

کوژرانیان. واتە: ئەمە شتێکەو لەلای خودا بڕاوەتەوەو دیاری کراوە، هیچ کەسێ ناتوانێ خۆی لێ لابداو ڕزگار بکات. پاشان خودای گەورە ئەفەرموێت: ﴿وَلِيَبْتَلِيَ اللَّهُ مَا فِي صُدُورِكُمْ وَلِيُمَحِّصَ مَا فِي قُلُوبِكُمْ﴾ خودا دەیەوێ دڵیان تاقی بکاتەوەو هەرچی لە دڵیاندا هەیە دەری بخات. واتە: هەتا تاقیتان بکاتەوە بەهۆی ئەوەی بەسەرتان هاتووە، هەتا چاکو خراپ لە یەکتری جیا ببێتەوەو خاوەن باوەڕ دەرکەوێو دووڕووەکان بۆ خەڵکی دەرکەون لە قسەو کردارەکانیاندا. ﴿وَاللَّهُ عَلِيمٌ بِذَاتِ الصُّدُورِ﴾ خودا لە ڕازی دڵەکانتان ئاگادارە، لەو شتانەی کە نهێنیو ئاشکرا نیە.

**باسی ڕاکردنی هەندێ لە خاوەن باوەڕان لە ڕۆژی ئوحوداو لێبوردنی خودا لێیان**

پاشان خودای گەورە ئەفەرموێت: ﴿إِنَّ الَّذِينَ تَوَلَّوْا مِنكُمْ يَوْمَ الْتَقَى الْجَمْعَانِ إِنَّمَا اسْتَزَلَّهُمُ الشَّيْطَانُ بِبَعْضِ مَا كَسَبُوا﴾ ئەوانەتان کە پشتیان هەڵکرد (لەو ڕۆژەدا کە دوو کۆمەڵ گەیشتنە یەك) شەیتان هەڵی خلیسکاندن، لەبەر کارێ کە کردبویان. واتە: بەهۆی هەندێ گوناهەوە کە لە پێشەوە کردبویان وەك هەندێ لە زانایانی پێشینە وتویانە: بێگومان پاداشتی چاکە هەر چاکەیەو پاداشتی خراپەیش دوایەکەی هەر خراپەیە. پاشان خودای گەورە ئەفەرموێت: ﴿وَلَقَدْ عَفَا اللَّهُ عَنْهُمْ إِنَّ اللَّهَ غَفُورٌ حَلِيمٌ﴾ خودایش بەخشینی (لەو هەڵاتنەی کە تووشیان هات). هەر خودایە کە لە گوناهان دەبورێو لەسەرخۆیە، بەرانبەر بە عەبدەکانیو چاوپۆشیان لێدەکات. ئیمامی ئەحمەد ڕیوایەتی کردووە لە شەقیقەوە، وتی: عەبدوڕەحمانی کوڕی عەوف گەیشت بە وەلیدی کوڕی عوقبەو وەلید پێی وت: چیە وا دەبینم لالوتی لە عوسمان گەورەی موسوڵمانان؟ عەبدوڕەحمان پێی وت: پێی بڵێ من لە ڕۆژی ئوحودا هەڵنەهاتووم لە ڕۆژی بەدریشا دوانەکەوتوومو لە ڕێبازی عومەریش لام نەداوە، عاسیم وتی: پاشان ڕۆشتو ئەوەی بۆ عوسمان گێڕایەوە وتی: عوسمان وتی: ئەوەی کە دەڵێ من لە ڕۆژی ئوحودا هەڵنەهاتووم، چۆن سەرزەنشتم دەکات بە تاوانێ کە خوا لێی بوراوە، خودای گەورە ئەفەرموێت:

﴿إِنَّ الَّذِينَ تَوَلَّوْا مِنكُمْ يَوْمَ الْتَقَى الْجَمْعَانِ إِنَّمَا اسْتَزَلَّهُمُ الشَّيْطَانُ بِبَعْضِ مَا كَسَبُوا وَلَقَدْ عَفَا اللَّهُ عَنْهُمْ إِنَّ اللَّهَ غَفُورٌ حَلِيمٌ﴾ وە ئەوەی کە دەڵێ: من لە ڕۆژی بەدر دواکەوتوم، من بێگومان بە دیاری ڕوقیەی کچی پێغەمبەری خوداوە بووم (ﷺ) هەتا کۆچی دوایی کرد، پێغەمبەری خودا (ﷺ) بەشێکی لە ڕۆژی بەدرا بۆ دانام. هەرکەسیش پێغەمبەر (ﷺ) بەشی بۆ دابنێ، ئەوە ئەو کەسە ئامادە

بووە. ئەوەیش کە دەڵێت: من وازم لە سونەتی عومەر هێناوە، بێگومان من توانای ئەو سونەتەی ئەوم نیە، ئەویش هەر ناتوانێ جێبەجێی بکات بڕۆ بۆ لای و ئەوەی بۆ باس بکە[1].

﴿يَٰٓأَيُّهَا ٱلَّذِينَ ءَامَنُواْ لَا تَكُونُواْ كَٱلَّذِينَ كَفَرُواْ وَقَالُواْ لِإِخْوَٰنِهِمْ إِذَا ضَرَبُواْ فِي ٱلْأَرْضِ أَوْ كَانُواْ غُزًّى لَّوْ كَانُواْ عِندَنَا مَا مَاتُواْ وَمَا قُتِلُواْ لِيَجْعَلَ ٱللَّهُ ذَٰلِكَ حَسْرَةً فِي قُلُوبِهِمْ وَٱللَّهُ يُحْيِۦ وَيُمِيتُ وَٱللَّهُ بِمَا تَعْمَلُونَ بَصِيرٌ ﴿١٥٦﴾ وَلَئِن قُتِلْتُمْ فِي سَبِيلِ ٱللَّهِ أَوْ مُتُّمْ لَمَغْفِرَةٌ مِّنَ ٱللَّهِ وَرَحْمَةٌ خَيْرٌ مِّمَّا يَجْمَعُونَ ﴿١٥٧﴾ وَلَئِن مُّتُّمْ أَوْ قُتِلْتُمْ لَإِلَى ٱللَّهِ تُحْشَرُونَ ﴿١٥٨﴾﴾

## ڕێگری لە چاولێکەری خوانەناسان لە پەیوەست کردنی مردن و فەرمانی قەدەر بە غەیرەز ویستی خودای گەورەوە

خودای گەورە ڕێگەی عەبدە خاوەن باوەڕەکانی نادات کە چاو لە خوانەناسان بکە لە بیرو بۆچوونی خراپ و ناپەسەندیانا کە لە قسەکانیانەوە وا دەردەکەوێ کە دەربارەی برا موسوڵمانەکانیان ئەوانەی کە مردوون لە سەفەرو جەنگەکانا، ئەگەر نەچوونایەو وایان نەکردایە ئەوەیان تووش نەدەهات کە تووشیان بووە. خودای گەورەیش ئەفەرموێت: ﴿يَٰٓأَيُّهَا ٱلَّذِينَ ءَامَنُواْ لَا تَكُونُواْ كَٱلَّذِينَ كَفَرُواْ وَقَالُواْ لِإِخْوَٰنِهِمْ إِذَا ضَرَبُواْ فِي ٱلْأَرْضِ أَوْ كَانُواْ غُزًّى لَّوْ كَانُواْ عِندَنَا مَا مَاتُواْ وَمَا قُتِلُواْ﴾ ئەی کۆمەڵی خاوەن باوەڕان، ئێوە وەك ئەوانە مەبن کە خودایان نەدەناسی و سەبارەت بە براکانیان (کە لە سەفەر یان لە شەڕی دوژمنان بوون) دەیانوت: ئەوانە لامان بمانایە نەدەمردن و نەدەکوژران. خودای گەورەیش ئەفەرموێت: ﴿لِيَجْعَلَ ٱللَّهُ ذَٰلِكَ حَسْرَةً فِي قُلُوبِهِمْ﴾ هەر بۆ ئەوە بوو خودا بیکا بە ئاخ و داخی سەر دڵیان. واتە: بۆیە ئەو بیرو بڕوایەی خستە ناو دڵیان هەتا زیاتر داخ و خەفەت بخاتە دڵیان بۆ مردن و کوشتنیان، پاشان خودای گەورە وەڵامیان ئەداتەوەو ئەفەرموێت: ﴿وَٱللَّهُ يُحْيِۦ وَيُمِيتُ﴾ خودایە کە ژیان ئەداو دەشمرێنێ. واتە: هەر خودا لە سەرەتاوە دروستی کردووەو هەموو شتێ دەگەڕێتەوە بۆ لای ئەو. هیچ کەسێ ناژیٖ و نامرێ بە ویستی ئەو نەبێ و بڕیاری لەسەر نەدات. تەمەنی کەس زیاد ناکات و کەمیش نابێتەوە بە فەرمان و بڕیاری ئەو نەبێ. ﴿وَٱللَّهُ بِمَا تَعْمَلُونَ بَصِيرٌ﴾ وە هەر کارێ ئێوە دەیکەن خودا دەیبینێ. واتە: خودا دەزانێ و دەبینێ و ئاگاداری گشت دروسکراوەکانیە هیچ شتێکی ئەوانی لێ ناشارێتەوە. پاشان خودای گەورە ئەفەرموێت: ﴿وَلَئِن قُتِلْتُمْ فِي سَبِيلِ ٱللَّهِ أَوْ مُتُّمْ لَمَغْفِرَةٌ مِّنَ ٱللَّهِ وَرَحْمَةٌ خَيْرٌ مِّمَّا يَجْمَعُونَ﴾ ئەگەر لە ڕێی خودا بمرن یان لە ڕێی خودا بکوژرێن، دیارە

---

[1] احمد (١/٦٨)، فەرموودەیەکی حەسەنە.

لێخۆشبونی خوداو بەزەیی ئەو زکۆر چاکترە لەو شتەی کۆی دەکەنەوە. ئەم ئایەتە ئەوە دەگەیەنێ کە کوژران لە ڕێی خوداو مردن لە ڕێی خودا هۆکارێکە بۆ وەدەست هێنانی بەزەییو لێبوردنیو ڕەزامەندی خودا، ئەمەیش لە مانەوە لە دنیاو کۆکردنەوەی ماڵو سامان چاکترە کە بۆ هیچ کەس نامێنێتەوە پاشان خودای گەورە هەواڵمان ئەداتێ کە هەرکەسێ بمرێ یان بکوژرێ لە دوایدا هەر دەگەڕێتەوە بۆ لای خودای گەورە، پاداشتی ئەداتەوە لەسەر کردارەکانی ئەگەر چاك بوبێ بە چاکەو ئەگەر خراپیش بوبێ بە خراپەو جەزرەبەدانو ئەفەرموێت: ﴿وَلَئِن مُّتُّمْ أَوْ قُتِلْتُمْ لَإِلَى ٱللَّهِ تُحْشَرُونَ﴾ ج بمرنو ج بکوژرێن بێ گومانە هەر لەلای خودا کۆدەکرێنەوە.

﴿فَبِمَا رَحْمَةٍ مِّنَ ٱللَّهِ لِنتَ لَهُمْ ۖ وَلَوْ كُنتَ فَظًّا غَلِيظَ ٱلْقَلْبِ لَٱنفَضُّوا۟ مِنْ حَوْلِكَ ۖ فَٱعْفُ عَنْهُمْ وَٱسْتَغْفِرْ لَهُمْ وَشَاوِرْهُمْ فِى ٱلْأَمْرِ ۖ فَإِذَا عَزَمْتَ فَتَوَكَّلْ عَلَى ٱللَّهِ ۚ إِنَّ ٱللَّهَ يُحِبُّ ٱلْمُتَوَكِّلِينَ ﴿١٥٩﴾ إِن يَنصُرْكُمُ ٱللَّهُ فَلَا غَالِبَ لَكُمْ ۖ وَإِن يَخْذُلْكُمْ فَمَن ذَا ٱلَّذِى يَنصُرُكُم مِّنۢ بَعْدِهِۦ ۗ وَعَلَى ٱللَّهِ فَلْيَتَوَكَّلِ ٱلْمُؤْمِنُونَ ﴿١٦٠﴾ وَمَا كَانَ لِنَبِىٍّ أَن يَغُلَّ ۚ وَمَن يَغْلُلْ يَأْتِ بِمَا غَلَّ يَوْمَ ٱلْقِيَٰمَةِ ۚ ثُمَّ تُوَفَّىٰ كُلُّ نَفْسٍ مَّا كَسَبَتْ وَهُمْ لَا يُظْلَمُونَ ﴿١٦١﴾ أَفَمَنِ ٱتَّبَعَ رِضْوَٰنَ ٱللَّهِ كَمَنۢ بَآءَ بِسَخَطٍ مِّنَ ٱللَّهِ وَمَأْوَىٰهُ جَهَنَّمُ ۚ وَبِئْسَ ٱلْمَصِيرُ ﴿١٦٢﴾ هُمْ دَرَجَٰتٌ عِندَ ٱللَّهِ ۗ وَٱللَّهُ بَصِيرٌۢ بِمَا يَعْمَلُونَ ﴿١٦٣﴾ لَقَدْ مَنَّ ٱللَّهُ عَلَى ٱلْمُؤْمِنِينَ إِذْ بَعَثَ فِيهِمْ رَسُولًا مِّنْ أَنفُسِهِمْ يَتْلُوا۟ عَلَيْهِمْ ءَايَٰتِهِۦ وَيُزَكِّيهِمْ وَيُعَلِّمُهُمُ ٱلْكِتَٰبَ وَٱلْحِكْمَةَ وَإِن كَانُوا۟ مِن قَبْلُ لَفِى ضَلَٰلٍ مُّبِينٍ ﴿١٦٤﴾﴾

### لە ڕەوشتەکانی پێغەمبەرمان موحەممەد (ﷺ) دڵۆڤانیو نەرمو نیانیە

خودای گەورە ڕووی وتەی دەکاتە پێغەمبەرەکەیو منەت دەکات بەسەریداو بەسەر بڕواداارانیشدا کە چەندە نەرمو نیانە بەرانبەر ئوممەتەکەی، ئەوانەی کە شوێن فەرمانەکانی دەکەونو توندو تیژ نیە لەگەڵیانو زۆر بە چاکی لەگەڵیان ئەدوێتو ئەفەرموێت: ﴿ فَبِمَا رَحْمَةٍ مِّنَ ٱللَّهِ لِنتَ لَهُمْ﴾ لە بەزەیی خوداوەیە کە تۆ هێندە نەرمو نیانی لەگەڵیان. واتە: ج شتێ وای لە تۆ کردووە ئەی موحەممەد (ﷺ) کە بەرانبەر خاوەن باوەڕان نەرمو نیان بی، ئەگەر بەزەیی خودا نەبێ بە تۆو ئەوانیش. قەتادە وتی: ﴿ فَبِمَا رَحْمَةٍ مِّنَ ٱللَّهِ لِنتَ لَهُمْ﴾ واتە: بەهۆی بەوەیی خوداوەیە کە تۆ نەرمو نیانی بەرانبەر خاوەن باوەڕان. عەرەبەکان (ما)یان پەیوەست کردووە بە مەعریفەوە وەك خودای گەورەیش ئەفەرموێت: ﴿ فَبِمَا نَقْضِهِم مِّيثَٰقَهُمْ ﴾ وە پەیوەستیشیان کردووە بە نەکیرەوە وەك خوای مەزن دەفەرموێت: ﴿عَمَّا قَلِيلٍ﴾ هەر بۆیە لێرەشدا دەفەرموێت: ﴿ فَبِمَا رَحْمَةٍ مِّنَ ٱللَّهِ لِنتَ لَهُمْ﴾ واتە: بەزەییە لەلایەن خوداوە. حەسەنی بەسری وتی: ئەمە ڕەوشتی موحەممەدە (ﷺ) کە خودا ناردویەتی پێی. ئەم

ئایەتە پیرۆزە لەو ئایەتە دەچێ کە خودای گەورە ئەفەرموێت: ﴿لَقَدْ جَآءَكُمْ رَسُولٌ مِّنْ أَنفُسِكُمْ عَزِيزٌ عَلَيْهِ مَا عَنِتُّمْ حَرِيصٌ عَلَيْكُم بِٱلْمُؤْمِنِينَ رَءُوفٌ رَّحِيمٌ﴾[1] پێغەمبەرێك هاتە لاتان، لە خۆتانە، هەر بەلایە بەسەرتان بێ، لای گرانە، دڵی زۆر لەلای ئێوەیە. دڵسۆزی خاوەن باوەڕانەو دڵۆڤانە بۆیان. پاشان خودای گەورە ئەفەرموێت: ﴿وَلَوْ كُنتَ فَظًّا غَلِيظَ ٱلْقَلْبِ لَٱنفَضُّوا۟ مِنْ حَوْلِكَ﴾ ئەگەر کەسێکی دڵ ڕەق و توندو تیژ بویتایە، بڵاوەیان لێ دەکردی. (الفظ) مەبەست پێی لێرەدا قسەی ڕەقە. بەپێی ئەوەدا پاشان ئەفەرموێت: ﴿غَلِيظَ ٱلْقَلْبِ﴾ واتە: ئەگەر تۆ قسە خراپ و دڵڕەق بویتایە لەگەڵیان لە دەورت دەتەکینەوەو وازیان لێت دەهێنا. بەڵام خودای گەورە کۆی کردنەوە لە دەورت. دڵتی نەرم کردووە بەرانبەریان هەتا دڵیان ڕابێت، وەك عەبودڵڵای کوڕی عەمر وتی: دەم خراپ و دڵڕەق نەبوەو نەزان دو نەبوە لە بازاڕەکاندا. پاداشتی خراپەی بە خراپە نەداوەتەوە هەمیشە لێبوردەو چاوپۆشی کردووە[2].

## فەرماندان بە ڕاوێژ کردن و کارپێکردنی

خودای گەورە ئەفەرموێت: ﴿فَٱعْفُ عَنْهُمْ وَٱسْتَغْفِرْ لَهُمْ وَشَاوِرْهُمْ فِى ٱلْأَمْرِ﴾ تۆ بیانبورەو لەلای خودا داوای لێبوردنیان بۆ بکەو لە کار ڕاوێژیان پێ بکە. هەر لەبەر ئەوە بوو پێغەمبەری خودا (ﷺ) هەر ڕوداوێ ڕوی بدایە ڕاوێژی بە هاوەڵەکانی دەکرد، بۆ دڵنیا کردنیان هەتا بە گوڕو هێزەوە بەو کارە هەڵسن کە پێیان ئەسپێرێ، وەك ڕاوێژی پێکردن لە ڕۆژی بەدرا بە ڕۆشتن بۆ کاروانەکە، ئەوانیش وتیان: ئەگەر بمانبەیتە ناو دەریاش لەگەڵتا دەیبڕین، بەرەو (بَرْكَ الغُماد)یش بمانبەیت لەگەڵتا دێین. ئێمە واناڵێین، وەك هۆزی مووسا بە مووسایان وت (سەلامی خوای لێ بێت) تۆو پەروەردگارت بچن شەڕ بکەن ئێمە لێرەدا دادەنیشین، بەڵکو دەڵێین: فەرموو بڕۆ ئێمەش لەگەڵتین و لەخزمەتتداین لەلای ڕاستو لەلای چەپتەوە دەجەنگین. وە ڕاوێژی پێکردن کە لە مەدینە بمێننەوە یان دەرچن بۆ دوژمن، زۆرینەی هاوەڵەکان ڕایان وا بوو کە بڕۆنە دەرەوە، پێغەمبەریش (ﷺ) چووە دەرەوە بۆیان. لە ڕۆژی خەندەقیشا ڕاوێژی پێکردن لە ڕێکەوتنی ئەحزابدا لەسەر سێ یەکی بەروبومی مەدینە، هەردوو سەعدەکە، سەعدی کوڕی مەعازو سەعدی کوڕی عوبادە ڕازی نەبوون، پێغەمبەر (ﷺ) وازی لەوە هێنا. وە لە ڕۆژی حودەیبیەدا ڕاوێژی پێکردن کە بدەن بەسەر ماڵو منداڵی بت پەرستەکانا. ئەبوبەکر پێی وت: ئێمە بۆ ئەوە نەهاتووین بۆ شەڕ کردن لەگەڵ کەسا، بەڵکو ئێمە هاتووین بۆ عومرە کردن.

---

[1] التوبة (١٢٨).

[2] فتح الباري (٤٤٩/٨).

پێغەمبەریش (ﷺ) قسەکەی قەبوڵ کرد. وە پێغەمبەر (ﷺ) لە بەسەرهاتی بوختانەکەدا فەرمووی: (ئەی کۆمەڵی موسوڵمانان وتوێژم لەگەڵا بکەن دەربارەی کۆمەڵێ کە بوختانیان بۆ خێزانم کردووەو تۆمەتباریان کردوون. سوێند بە خوا هیچ خراپەیەکم لە خێزانەکانم نەدیوە بوختانیشیان بە کێوە کردووە؟ سوێند بە خوا جگە لە چاکە لەوەیش هیچم نەدیوە)[1] پێغەمبەری خودا (ﷺ) ڕاوێژی بە عەلیو ئوسامە کرد بۆ جیا بونەوە لە عائیشە (ڕەزای خوای لێ بێت) کە لە جەنگەکانیشا هەر ڕاوێژی پێدەکردن، ئیبنوماجە ڕیوایەتی کردووە لە ئەبوهورەیرەوە لە پێغەمبەرەوە (ﷺ) کە فەرموویەتی: (ڕاوێژکار جێی بڕوایە)[2] ئەبوداودو تیرمیزیش ڕیوایەتیان کردووە. نەسائیش بە فەرموودەیەکی حەسەنی داناوە[3].

## پشت بە خودا بەستن دوای ڕاوێژ کردن

خودای گەورە ئەفەرموێت: ﴿فَإِذَا عَزَمْتَ فَتَوَكَّلْ عَلَى اللَّهِ﴾ وەختێ لێبڕای کارێ بکەی هەر پشت بە خوا ببەستە. واتە: کاتێ ڕاوێژت کرد لە کارێکاو بڕیارت دا بیکەی پشت بە خوا ببەستە تێیدا. ﴿إِنَّ اللَّهَ يُحِبُّ الْمُتَوَكِّلِينَ﴾ خودا ئەوانەی خۆش دەوێ کە خۆیان هەر بە خوا دەسپێرن. خودای گەورە پاشان ئەفەرموێت: ﴿إِن يَنصُرْكُمُ اللَّهُ فَلَا غَالِبَ لَكُمْ ۖ وَإِن يَخْذُلْكُمْ فَمَن ذَا الَّذِي يَنصُرُكُم مِّن بَعْدِهِ ۗ وَعَلَى اللَّهِ فَلْيَتَوَكَّلِ الْمُؤْمِنُونَ﴾ ئەگەر خودا یارمەتیتان بدات، کەس بەسەرتانا زاڵ نابێ، ئەگەر وازیشتان لێ بێنێ، کێ دەتوانێ پاشان یارمەتیتان بدات؟ با خاوەن باوەڕان هەر خۆیان بە خودا بسپێرن. وەك لە پێشەوە خودای گەورە فەرمووی: ﴿وَمَا النَّصْرُ إِلَّا مِنْ عِندِ اللَّهِ الْعَزِيزِ الْحَكِيمِ﴾[4] سەرکەوتنیش هەر بە دەستی خودای خاوەن دەسەڵاتی لەکارزانە. پاشان داوا لە خاوەن باوەڕان دەکات کە هەر خۆیان بە خوا بسپێرنو ئەفەرموێت: ﴿إِنَّ اللَّهَ يُحِبُّ الْمُتَوَكِّلِينَ﴾ با خاوەن باوەڕان هەر خۆیان بە خوا بسپێرن.

## خەیانەت کردن لە کارو پیشەی پێغەمبەران (سەلامی خوایان لێ بێت) نیە

خودای گەورە ئەفەرموێت: ﴿وَمَا كَانَ لِنَبِيٍّ أَن يَغُلَّ﴾ بۆ هیچ پێغەمبەران ناشێ لەگەڵ خەڵکی خەیانەت بکات. ئیبنوعەبباسو موجاهیدو حەسەنو کەسانی تریش وتیان: بۆ پێغەمبەرێ نیە کە

---

[1] البخاري (٤٧٥٧).

[2] إبن ماجة (٢/١٢٣٣)، فەرموودەیەکی سەحیحە.

[3] أبوداود (٥/٣٤٥)، تحفة الاحوذي (٨/١٠٩)، سەحیحە.

[4] آل عمران (١٢٦).

خەیانەت بکات[1] ئیبنوجەریر ڕیوایەتی کردووە لە ئیبنوعەبباسەوە لەم ئایەتەدا ﴿ وَمَا كَانَ لِنَبِيٍّ أَن يَغُلَّ ﴾ وتی: ئەم ئایەتە دەربارەی قوماشێکی مەخمەڵی سوور هاتە خوارەوە لە ڕۆژی غەزای بەدرا وون بوو، پێغەمبەری خودا (ﷺ) سوپایەکی نارد هەندێ کەس دەیان وت لەوە دەچێ پێغەمبەری خودا (ﷺ) هەڵی گرتبێ. قسەی زۆریان کرد لەو بارەیەوە خودای گەورە ئەم ئایەتەی ناردە خوارەوە: ﴿وَمَن يَغْلُلْ يَأْتِ بِمَا غَلَّ يَوْمَ ٱلْقِيَـٰمَةِ ﴾[2] بۆ هیچ پێغەمبەرێ ناشێ لەگەڵ خەڵکی خەیانەت بکات. هەرکەس خەیانەت بکات، بەو خەیانەتەی کردوویەتی دێت لە ڕۆژی قیامەتدا. هەر بەم شێوەیە ئەبوداودو تیرمیزی ڕیوایەتیان کردووە، تیرمیزی وتی: فەرموودەیەکی حەسەنی غەریبە[3]. ئەمە پاکانەیەکە کە بۆ پێغەمبەری خودا (ﷺ) کە بە هیچ شێوەیەك خەیانەت ناکات لە جێبەجێ کردنی ئەمانەتو دابەشکردنی دەستکەوتو هەر شتێکی ترا. پاشان ئەفەرموێت: ﴿ثُمَّ تُوَفَّىٰ كُلُّ نَفْسٍ مَّا كَسَبَتْ وَهُمْ لَا يُظْلَمُونَ ﴾ بۆ هیچ پێغەمبەرێ ناشێ لەگەڵ خەڵکی خەیانەت بکات، هەرکەس خەیانەت بکات، بەو خەیانەتەی کردویەتی دێت لە ڕۆژی قیامەتدا. ئەوسا هەرکەس بەرانبەر کردەوەی خۆی سزا ئەدرێو هیچ ناهەقیان لێ ناکرێ. ئەمە بەڵێنو هەڕەشەیەکی زۆر توندە، فەرموودەی زۆریش لەم بارەیەوە هاتووە، ئیمامی ئەحمەد ڕیوایەتی کردووە لە ئەبومالیکی ئەشجەعیەوە لە پێغەمبەری خوداوە (ﷺ) کە فەرموویەتی: (گەورەترین خەیانەت لەلای خودا باڵێ زەویە لەنێوان دوو دراوسێدا ببێ (لە خانویەکدا) دراوسێیەکان باڵێ لە بەشی ئەوی تر ببڕێ، خۆ ئەگەر بڕی زنجیر دەکرێ لە حەوت تەبەقەی زەوی پێی هەتا ڕۆژی قیامەت)[4] ئیمامی ئەحمەد ڕیوایەتی کردووە لە ئەبوحومەیدی ساعدیەوە وتی: پێغەمبەری خودا پیاوێکی لە ئەزدیەکان بەکارهێنا بۆ زەکات کۆکردنەوە، پێیان دەوت ئیبنولوتبییە هاتەوەو وتی: ئەمە بۆ ئێوەو ئەوەیش بە دیاری بە خۆم دراوە. پێغەمبەری خودا لەسەر مینبەرەکەی هەڵساو فەرمووی: (حاڵی ئەو کرێکارە چۆنە کە دەینێرینو دەگەڕێتەوەو دەڵێت: ئەمە بۆ ئێوەو ئەوەیش بە دیاری بە خۆم دراوە، ئایا لە ماڵو باوکیو دایکیا دانیشایەو چاوەڕوانی بکردایە ئایا ئەو دیاریەی بۆ دەهات یان بۆی نەدەهات؟ سوێند بەو کەسەی گیانی موحەممەدی (ﷺ) بەدەستە هیچ کەسێ لە ئێوە نایەت کە شتێکی لەوانە بردبێ مەگین ئەو شتە لە ڕۆژی قیامەتدا بەسەر ملیەوەیە، ئەگەر وشتر بێدەنگی لێوە دێ، یان وڵاخ بێ دەنگی لێوە دێ یان مەڕو بزن بێ دەقاڕێنێ).

---

[1] إبن أبي حاتم (٢/٣٧).

[2] الطبري (٧/٣٤٨).

[3] أبوداود (٤/٢٨٠)، تحفة الاحوذي (٨/٣٥٩)، سەنەدەکانی لاوازە.

[4] أحمد (٤/١٤٠)، حەسەنە.

پاشان دەستەکانی بەرز کردەوە هەتا سپیایی بن باڵمان بینی. پاشان فەرمووی: (ئەی خودایە ئایا ڕام گەیاند) سێ جار فەرمووی، هیشامی کوڕی عوروە ئەمەی بۆ زیاد کرد، ئەبوحومەید وتی: بە چاوی خۆم بینیمو بە گوێی خۆم بیستم، پرسیاریش لە زەیدی کوڕی سابیتیش بکەن، بوخاریو موسلیمش هێناویانە[1] تیرمیزی ڕیوایەتی کردووە لە کتێبی (الاحكام)دا لە مەعازی کوڕی جەبەلەوە وتی: پێغەمبەری خودا (ﷺ) ناردمی بۆ یەمەن. کاتێ کە ڕۆشتم ناردی بە دوامداو گەڕامەوە فەرمووی: (ئایا دەزانی بۆچی ناردم بە شوێنتا؟ دەست لە هیچ شتێ نادەی بە ئیزنی من نەبێ، چونکە ئەوە خەیانەتە ﴿وَمَن يَغْلُلْ يَأْتِ بِمَا غَلَّ يَوْمَ الْقِيَـٰمَةِ﴾ لەبەر ئەوە بانگم کردی بڕۆ بۆ کارەکەت)[2] دیسان ئیمامی ئەحمەد ڕیوایەتی کردووە لە ئەبوهورەیرەوە وتی: ڕۆژێ پێغەمبەری خودا (ﷺ) لەناوماندا هەڵساو باسی خەیانەتی (الغُلول) کرد زۆر بە گەورەو کارێکی گەورەی دانا پاشان فەرمووی: (با هیچ کەسێ لە ئێوە لە ڕۆژی قیامەتدا نەیەت وشترێ لەسەر ملی بێت کە دەنگێکی لێوە بێ‌و بڵێ ئەی پێغەمبەری خودا (ﷺ) فریان کەوە، منیش ئەڵێم: هیچ توانایەکم نیە لەلای خودا بۆت. وە هیچ کەسێ لە ئێوە لە ڕۆژی قیامەتدا نەیەت ئەسپێك بەسەر شانیەوە بێ‌و پرمە بکاتو بڵێ: ئەی پێغەمبەری خودا (ﷺ) فریام کەوە. منیش ئەڵێم: هیچ توانایەکم نیە لەلای خودا بۆت، بێگومان پێم ڕاگەیاندوی. وە هیچ کەسێ لە ئێوە لە ڕۆژی قیامەتدا نەیەت پەڕۆیەك بەسەر ملیەوەیەو دەجولێ‌و دەڵێ: ئەی پێغەمبەری خودا (ﷺ) فریام کەوە، منیش ئەڵێم: هیچ توانایەکم نیە لەلای خودا بۆت. پێم ڕاگەیاندی وە هیچ کەسێ لە ئێوە لە ڕۆژی قیامەتدا نەیەت، شتێکی بێ گیان (وەك زێڕو زیو) بەسەر ملیەوەیەو دەڵێ: ئەی پێغەمبەری خودا (ﷺ) فریام کەوە، منیش دەڵێم: هیچ توانایەکم نیە لەلای خودا بۆت، پێم ڕاگەیاندی).[3] بوخاریو موسلیمش ڕیوایەتیان کردووە[4] دیسان ئیمامی ئەحمەد ڕیوایەتی کردووە لە عومەری کوڕی خەتابەوە وتی: کاتێ چەند کەسێ لە هاوەڵەکانی پێغەمبەری خودا (ﷺ) هاتنە خزمەتیو وتیان: فلان شەهیدەو فلان شەهیدە، هەتا هاتنە سەر پیاوێ‌و وتیان فلانیش شەهیدە. پێغەمبەری خودا (ﷺ) فەرمووی: (نەخێر من لەناو ئاگرا چاوم پێی کەوت. بە پۆشاکێکەوە بە خەیانەت بردویەتی). پاشان پێغەمبەری خودا (ﷺ) فەرمووی: (ئەی کوڕی خەتاب بڕۆ بانگەواز بکە لەناو خەڵکیا: خاوەن باوەڕ نەبێ ناچێتە بەهەشت) وتی: چوومە دەرەوە بانگەوازم کردو وتم: ئەوسا

---

[1] أحمد (٥/٤٢٣)، البخاري (٢٥٩٧/٧١٧٤)، مسلم (١٨٣٢).

[2] تحفة الاحوذي (٤/٥٦٤)، حەسەنی غەریبە.

[3] أحمد (٢/٤٢٦)، فەرموودەیەکی سەحیحە.

[4] فتح الباري (٦/٢١٤)، مسلم (٣/١٤١٦).

بزانن جگە لە خاوەن باوەڕ ناچێتە بەهەشت. هەر بەو شێوەیە موسلیم و تیرمیزی ڕیوایەتیان کردووە تیرمیزی وتی: فەرموودەیەکی حەسەنی سەحیحە[1].

## باوەڕ پێکراو خەیەنەتکار وەك یەك نین

خودای گەورە ئەفەرموێت: ﴿أَفَمَنِ اتَّبَعَ رِضْوَانَ اللَّهِ كَمَنْ بَاءَ بِسَخَطٍ مِنَ اللَّهِ وَمَأْوَاهُ جَهَنَّمُ وَبِئْسَ الْمَصِيرُ﴾ ئاخۆ کەسێ هەر بۆ ڕەزای خوا هەوڵی داوە، وەك ئەوەیە کە خودجای لە خۆی تووڕە کرد؟ کە شوێنی ئەم جەهەنەمو چارەنووسی خراپی هەیە. واتە: ئەوەی شوێن ڕەزامەندی خودا کەوتوە لە بەرنامەی ئەو لای نەداوە، ئەوە شایستەی لێخۆشبوون و پاداشتی مەزنەو پارێزراوە لە سزاو تۆڵەی خوداو ئەو کەسەی کە شایەنی تووڕەیی خودایەو دەرباز بوونی نیەو لە ڕۆژی قیامەتدا شوێنی جەهەنەمە کە خراپترین شوێنە وەك یەك نیە. ئەم ئایەتە نمونەی زۆرە لە قورئاندا وەك خودای گەورە ئەفەرموێت: ﴿أَفَمَن يَعْلَمُ أَنَّمَا أُنزِلَ إِلَيْكَ مِن رَّبِّكَ الْحَقُّ كَمَنْ هُوَ أَعْمَىٰ﴾[2] ئاخۆ کەسێ بڕوای وابێ ئەوەی لە پەروەردگارتەوە بۆ تۆ هاتۆتە خوارەوە هەموو ڕاستە وەك ئەوەیە کە لەم بارەیەوە کوێرو نابینایە؟ وەك ئەم ئایەتەیش کە ئەفەرموێت: ﴿أَفَمَن وَعَدْنَاهُ وَعْدًا حَسَنًا فَهُوَ لَاقِيهِ كَمَن مَّتَّعْنَاهُ مَتَاعَ الْحَيَاةِ الدُّنْيَا﴾[3] ئاخۆ کەسێ بەڵێنی باشمان پێداوەو بۆشی پێك دێ، لەگەڵ کەسێ هەر لە دنیادا ژیاندومانە وەك یەکن؟ پاشان خودای گەورە ئەفەرموێت: ﴿هُمْ دَرَجَاتٌ عِندَ اللَّهِ﴾ بۆ هەموو ئەو کۆمەڵانە خودا پلەی داناوە حەسەنی بەسری و موحەممەدی کوڕی ئیسحاق وتیان: واتە: کۆمەڵی خێرو چاکەو کۆمەڵی شەڕو خراپە پلە پلەن.[4] ئەبوعوبەیدەی کەسائی وتی: واتە شوێنەکانیان و پلەکانیان جیاوازە لە بەهەشتاو لە پلەکانی ناو ئاگرا وەك خودای گەورە ئەفەرموێت: ﴿وَلِكُلٍّ دَرَجَاتٌ مِّمَّا عَمِلُوا﴾[5] بۆ هەر کەسێ (بەرانبەر بە ئاکاری خۆی) چەندین پلەو پایە هەیە. بۆیە خودای گەورە ئەفەرموێت: ﴿وَاللَّهُ بَصِيرٌ بِمَا يَعْمَلُونَ﴾ خودا خۆی چاودێرە بەوەی کە دەیکەن. بەو زوانە پاداشتیان ئەداتەوەو لە چاکەدا ناهەقیان لێ ناکات و. خراپەی زیادیشیان لەسەر نانوسێ، هەرکەسەو بەپێی کرداری خۆی مامەڵەی لەگەڵا دەکات.

---

[1] أحمد (١/٣٠)، مسلم (١١٤)، تیرمیزي (١٥٧٤)، سەحیحە.

[2] الرعد (١٩).

[3] القصص (٦١).

[4] إبن أبي حاتم (٢/٦٤٢)، الطبري (١/٣٦٧).

[5] الانعام (١٣٢).

**ڕەوانە کردنی موحەممەد (ﷺ) بەهرەیەکی زۆر مەزنە**

خودای گەورە ئەفەرموێت: ﴿لَقَدْ مَنَّ اللَّهُ عَلَى الْمُؤْمِنِينَ إِذْ بَعَثَ فِيهِمْ رَسُولًا مِّنْ أَنفُسِهِمْ﴾ باوەڕداران بەر منەتی چاکەی خودان، کە یەکێك هەر لە خۆیانی ناردوە پێغەمبەریان بێ. بۆ ئەوەی وتوێژی لەگەڵا بکەن و پرسیاری لێ بکەن و لەگەڵی دابنیشن و بەهرەی لێ وەرگرن. وەك لە ئایەتی تریشا ئەفەرمووێتی: ﴿ وَمِنْ آيَاتِهِ أَنْ خَلَقَ لَكُم مِّنْ أَنفُسِكُمْ أَزْوَاجًا لِّتَسْكُنُوا إِلَيْهَا ﴾[1] هەر لە نیشانەکانی ئەوە کە لە خۆتان، هاوجووتی بۆ بەرهەم هێنان، وە ئەفەرموێت: ﴿قُلْ إِنَّمَا أَنَا بَشَرٌ مِّثْلُكُمْ يُوحَىٰ إِلَيَّ أَنَّمَا إِلَٰهُكُمْ إِلَٰهٌ وَاحِدٌ﴾[2] بڵێ: منیش هەر مرۆڤێکم وەك ئێوە لە خوداوە فەرمانم بۆ دێ کە خودای ئێوە هەر یەك خودایە. وە ئەفەرموێت: ﴿وَمَا أَرْسَلْنَا قَبْلَكَ مِنَ الْمُرْسَلِينَ إِلَّا إِنَّهُمْ لَيَأْكُلُونَ الطَّعَامَ وَيَمْشُونَ فِي الْأَسْوَاقِ﴾[3] لە پێش تۆشا هەرکەسێکمان بۆ پێغەمبەری ناردوە، هەموو خواردنیان خواردوە و لەناو بازاڕان گەڕاون. وە ئەفەرموێت: ﴿ وَمَا أَرْسَلْنَا مِن قَبْلِكَ إِلَّا رِجَالًا نُّوحِي إِلَيْهِم مِّنْ أَهْلِ الْقُرَىٰ﴾[4] پێشتر لە تۆش هەر پیاوانێ لە خەڵکی شارەکانمان لەلایەن خۆمان نیگا بۆ کرد. وە ئەفەرموێت: ﴿يَا مَعْشَرَ الْجِنِّ وَالْإِنسِ أَلَمْ يَأْتِكُمْ رُسُلٌ مِّنكُمْ ﴾[5] ئەی کۆمەڵی جنۆکە و مرۆڤ مەگەر پێغەمبەرانێکتان هەر لە خۆتان بۆ نەهات. ئەمە گەورەترین منەتە کە خودای گەورە پێغەمبەری بۆ ناردون هەر لە خۆیان، هەر بۆیە لێرەدا ئەفەرموێت: ﴿يَتْلُو عَلَيْهِمْ آيَاتِهِ﴾ نیشانەکانی خودایان بەسەردا دەخوێنێتەوە واتە: قورئان. ﴿وَيُزَكِّيهِمْ ﴾ بە پاکیش ڕایان دەگرێ. واتە: فەرمانیان پێدەکات بە چاکە و ڕێگریان لێدەکات لە خراپە. بۆ ئەوەی گیانی خۆیان پاك ڕاگرن و لە پیس و چەپەڵی ناپاکی دوریان بخاتەوە کە لە چەرخی نەفامیدا پێیەوە گیرۆدە بوون. کە بت پەرست و نەفام بوون. ﴿وَيُعَلِّمُهُمُ الْكِتَابَ وَالْحِكْمَةَ ﴾ وە لە کتێب و کارزانیدا ڕایان بێنێ. واتە: فێری قورئان و ئەرموودەکانیان بکات. ﴿وَإِن كَانُوا مِن قَبْلُ لَفِي ضَلَالٍ مُّبِينٍ ﴾ کە لە پێشدا لە گومڕایەکی ئاشکرادا بوون، واتە لە پێش هاتنی پێغەمبەرا (ﷺ) هەموو لە گومڕایی و نەفامیدا ژیانیان بەسەر دەبرد.

---

[1] الروم (٢١).
[2] الكهف (١١٠).
[3] الفرقان (٢٠).
[4] يوسف (١٠٩).
[5] الانعام (١٣٠).

﴿أَوَلَمَّآ أَصَٰبَتۡكُم مُّصِيبَةٞ قَدۡ أَصَبۡتُم مِّثۡلَيۡهَا قُلۡتُمۡ أَنَّىٰ هَٰذَاۖ قُلۡ هُوَ مِنۡ عِندِ أَنفُسِكُمۡۗ إِنَّ ٱللَّهَ عَلَىٰ كُلِّ شَيۡءٖ قَدِيرٞ ﴿١٦٥﴾ وَمَآ أَصَٰبَكُمۡ يَوۡمَ ٱلۡتَقَى ٱلۡجَمۡعَانِ فَبِإِذۡنِ ٱللَّهِ وَلِيَعۡلَمَ ٱلۡمُؤۡمِنِينَ ﴿١٦٦﴾ وَلِيَعۡلَمَ ٱلَّذِينَ نَافَقُواْۚ وَقِيلَ لَهُمۡ تَعَالَوۡاْ قَٰتِلُواْ فِي سَبِيلِ ٱللَّهِ أَوِ ٱدۡفَعُواْۖ قَالُواْ لَوۡ نَعۡلَمُ قِتَالٗا لَّٱتَّبَعۡنَٰكُمۡۗ هُمۡ لِلۡكُفۡرِ يَوۡمَئِذٍ أَقۡرَبُ مِنۡهُمۡ لِلۡإِيمَٰنِۚ يَقُولُونَ بِأَفۡوَٰهِهِم مَّا لَيۡسَ فِي قُلُوبِهِمۡۚ وَٱللَّهُ أَعۡلَمُ بِمَا يَكۡتُمُونَ ﴿١٦٧﴾ ٱلَّذِينَ قَالُواْ لِإِخۡوَٰنِهِمۡ وَقَعَدُواْ لَوۡ أَطَاعُونَا مَا قُتِلُواْۗ قُلۡ فَٱدۡرَءُواْ عَنۡ أَنفُسِكُمُ ٱلۡمَوۡتَ إِن كُنتُمۡ صَٰدِقِينَ ﴿١٦٨﴾﴾

**هۆی تووش بوون بە زیان لە ڕۆژی ئوحودا و حیکمەتەکەی**

خـودای گـەورە ئەفـەرموێت: ﴿أَوَلَمَّآ أَصَٰبَتۡكُم مُّصِيبَةٞ قَدۡ أَصَبۡتُم مِّثۡلَيۡهَا﴾ ئایـا بۆچـی کاتێـك دووچارتان بوو ناخۆشیەك (لە ئوحوددا) بێگومـان ئێـوە دووقـاتی ئـەوەتان دووچاری ئـەوان کـرد (لـە بـەدردا). ئـەوە لـەو کاتـەدا بـوو لـە ڕۆژی ئوحـودا حـەفتا کـەس لـە موسـوڵمانان شـەهید بـوو. موسوڵمانەکانیش لە ڕۆژی بەدرا حەفتا کەسیان لـە بت پەرستەکان کوشت‌و حەفتاشیان لـێ بـەدیل گرتن ﴿قُلۡتُمۡ أَنَّىٰ هَٰذَا﴾ هیچ پرسیتان زیانەکەمان لەبەرچی بوو؟ بۆچی ئەمەمان بەسەرا هـات؟ ﴿قُلۡ هُوَ مِنۡ عِندِ أَنفُسِكُمۡ﴾ بلـێ: لـە خۆتانـەوە بـوو. ﴿إِنَّ ٱللَّهَ عَلَىٰ كُلِّ شَيۡءٖ قَدِيرٞ﴾ خـودا بـۆ هـەموو شـت خاوەن توانایە. ئیبنوئەبی حاتەم ڕیوایەتی کردووە لە عومەری کوڕی خەتابەوە وتی: لـە سـاڵی دوایـدا کە جەنگی ئوحود ڕوویدا، تۆڵەیان لێ سەنرایەوە بەوەی لە ڕۆژی بەدرا پێی هەڵسان کە فیدیـەیان لـە موشریکەکان وەرگرت، حـەفتا کەسـیان لـێ شـەهید کـرا. هاوەڵـەکانی پێغەمبـەر (ﷺ) لـە دەوری پێغەمبەر (ﷺ) هەڵاتن. یەکێ لە چوار دانەکەی شکێنراو خودەکەی سەری پارچە پارچە بوو، خـوێن بە نێوچاوانیدا هاتە خوارەوە خودای گەورە ئەم ئایەتەی ناردە خـوارەوە: ﴿أَوَلَمَّآ أَصَٰبَتۡكُم مُّصِيبَةٞ قَدۡ أَصَبۡتُم مِّثۡلَيۡهَا قُلۡتُمۡ أَنَّىٰ هَٰذَاۖ قُلۡ هُوَ مِنۡ عِندِ أَنفُسِكُمۡ﴾ بەهۆی ئەو فیدیەوە وەرتان گرت، موحەممەدی کوڕی ئیسحاق‌و ئیبنوجورەیج‌و ڕەبیعی کـوڕی ئەنـەس‌و سـوددی وتیـان: ﴿قُلۡ هُوَ مِنۡ عِندِ أَنفُسِكُمۡ﴾ بلێ: هەر لە خۆتانەوە بوو. واتە: بەهۆی سەرپێچی کردنتانەوە بوو لە فەرمانی پێغەمبـەر (ﷺ) کـاتێ کە فەرمانی پێدان کە لە شوێنی خۆتان نەجوڵێن‌و نەیەنە خوارەوە، مەبەست پێی تیرئەندازەکانە ﴿إِنَّ ٱللَّهَ عَلَىٰ كُلِّ شَيۡءٖ قَدِيرٞ﴾ خودا توانای بەسەر هەموو شتێکا هەیە‌و هەرچی بوێت دەیکات‌و بڕیار هـەر بڕیاری خۆیەتی‌و هیچ کەس بۆی نیـە دەس بخاتـە کـاری. پاشـان خـودای گـەورە ئەفـەرموێت: ﴿وَمَآ أَصَٰبَكُمۡ يَوۡمَ ٱلۡتَقَى ٱلۡجَمۡعَانِ فَبِإِذۡنِ ٱللَّهِ﴾ هەرچی ئەو ڕۆژە تووشتان هات کە دوو کۆمەڵەکە بە یەك گەیشتن

بە ئیزنی خودا بوو. واتە: هەڵاتنتان لەبەر دەست دوژمن‌و کوژرانی کۆمەڵێ لە ئێوە بە دەستی دوژمن‌و بریندار بوونی هەندێکی تریش، هەمووی بە ئیزنی خوداو بڕیاری ئەو بوو. کاری خودا پڕە لە کارزانی لەوبارەیەوە. ﴿وَلِيَعْلَمَ ٱلْمُؤْمِنِينَ﴾ هەتا خاوەن باوەڕان نیشان بداو دەرکەون. کە خۆڕاگر بوون‌و لە جێی خۆیان مانەوەو نەترسان. ﴿وَلِيَعْلَمَ ٱلَّذِينَ نَافَقُوا۟ وَقِيلَ لَهُمْ تَعَالَوْا۟ قَـٰتِلُوا۟ فِى سَبِيلِ ٱللَّهِ أَوِ ٱدْفَعُوا۟ قَالُوا۟ لَوْ نَعْلَمُ قِتَالًا لَّٱتَّبَعْنَـٰكُمْ﴾ تا دووڕووەکانیش بناسێ، پێیان وترا: ئێوەیش وەرن لە ڕێی خودا غەزا بکەن یا ببنە هێزی بەرگری، وتیان: ئەگەر بمانزانیایە تووشی شەڕ دەبن، ئەوا شوێنتان دەکەوتین لەگەڵتان دەبووین. واتە: ئەمە قسەی عەبدوڵلای کوڕی ئوبەیی‌و هاوەڵەکانی بوو کە لە ڕێگا گەڕانەوە هەندێ لە موسوڵمانانیش شوێنیان کەوتن‌و لەگەڵیان گەڕانەوە. کە ئەوان بگەڕێنەوەو شەڕ نەکەن‌و یارمەتیان نەدەن. بۆیە خودای گەورە ئەفەرموێت: ﴿أَوِ ٱدْفَعُوا۟﴾ یان ببنە هێزی بەرگری. ئیبنوعەبباس‌و عیکرمەو سەعیدی کوڕی جوبەیرو زەحاک‌و ئەبوساڵح‌و حەسەن‌و سوودی وتیان: واتە: ببنە هۆی زیاد کردنی ژمارەی موسوڵمانان. حەسەلی کوڕی ساڵح وتی: یارمەتیان بدەن بە دوعا بۆ کردن، هەندێ تر وتیان: ببنە پشتیوانیان. بیانویان ئەوە بوو کە دەیان وت: وەك خودای گەورە ئەفەرموێت: ﴿لَوْ نَعْلَمُ قِتَالًا لَّٱتَّبَعْنَـٰكُمْ﴾ ئەگەر بمان زانیایە تووشی شەڕ دەبن شوێنتان دەکەوتین، بەڵام وادیارە تووشی شەڕ نابن. خودای گەورەیش ئەفەرموێت: ﴿هُمْ لِلْكُفْرِ يَوْمَئِذٍ أَقْرَبُ مِنْهُمْ لِلْإِيمَـٰنِ﴾ ئەو ڕۆژە لە بێدینی نزیکتر بوون تا لە باوەڕ بە خودا. زانایان ئەم ئایەتەیان کردۆتە بەڵگە لەسەر ئەوە کە مرۆڤ ڕۆژگار دەیگۆڕێ، کات‌و ڕۆژی وا هەیە لە دوور لە خراپیەوە نزیکەو کاتی وایش هەیە لە خوداو لە بڕواوە نزیکترە وەك ئەفەرموێت: ﴿هُمْ لِلْكُفْرِ يَوْمَئِذٍ أَقْرَبُ مِنْهُمْ لِلْإِيمَـٰنِ﴾ پاشان خودای گەورە ئەفەرموێت: ﴿يَقُولُونَ بِأَفْوَٰهِهِم مَّا لَيْسَ فِى قُلُوبِهِمْ﴾ ئەو شتانەی کە بە دەم دەیڵێن، ئەوە نیە کە ڕازەو لە دڵیاندایە واتە: ئەوانە قسەیە دەڵێن کە لە دڵیاندا بڕوایان پێی نیەو بە ڕاستی نازانن، لەو قسانەی کە دەیڵێن: ﴿لَوْ نَعْلَمُ قِتَالًا لَّٱتَّبَعْنَـٰكُمْ﴾ ئەگەر بمانزانیایە تووشی شەڕ دەبن لەگەڵتان دەهاتین. ئەمانە زۆر چاك دەیانزانی کە لەشکرێکی دوژمن لە وڵاتێکی دوورەوە هاتوون‌و زۆر داخ لە دڵن بەهۆی ئەو کۆسەی کە بەسەریاندا هاتووە لە جەنگی بەدراو چەندین ئەوەندەی موسوڵمانەکان دەبن. کە بێگومانە تووشی شەڕ دەبن. هەر بۆیە خودای گەورە ئەفەرموێت: ﴿وَٱللَّهُ أَعْلَمُ بِمَا يَكْتُمُونَ﴾ خودا لەوەی دەیشارنەوە ئاگادارترە. وە دەفەرمووێت: ﴿ٱلَّذِينَ قَالُوا۟ لِإِخْوَٰنِهِمْ وَقَعَدُوا۟ لَوْ أَطَاعُونَا مَا قُتِلُوا۟﴾ ئەوانەی کە خۆیان نەچووبوونە غەزا بە هاوەڵانیان دەوت: ئەگەر بە

قسەیان بکردینایە نەدەکوژران. واتە: ئەگەر بە ڕاوێژی ئێمەیان بکردایەو دەرنەچونایە لەگەڵ ئەوانەدا نەدەکوژران کە کوژران. خودای گەورەیش ئەفەرموێت: ﴿قُلْ فَادْرَءُوا عَنْ أَنفُسِكُمُ الْمَوْتَ إِن كُنتُمْ صَادِقِينَ﴾ بڵێ: سا ئەگەر ڕاست دەکەن، خۆ لە مردن بپارێزن. واتە: ئەگەر دەرنەچوون کەسێکی بپاراستایە لە کوشتنو مردن. دەبوو ئێوە نەمردنایە، خۆ مردنیش دەبێ هەر پێتان بگات با لە کۆشکی قایمیشا بن، سا دەی مردن لە خۆتان دوور بخەنەوە ئەگەر ڕاست دەکەن. موجاهید وتی لە جابیری کوڕی عەبدوللاوە ئەم ئایەتە لەسەر عەبدوللای کوڕی ئوبەیی کوڕی سەلول هاتە خوارەوە[1].

﴿وَلَا تَحْسَبَنَّ الَّذِينَ قُتِلُوا فِي سَبِيلِ اللَّهِ أَمْوَاتًا ۚ بَلْ أَحْيَاءٌ عِندَ رَبِّهِمْ يُرْزَقُونَ ﴿١٦٩﴾ فَرِحِينَ بِمَا آتَاهُمُ اللَّهُ مِن فَضْلِهِ وَيَسْتَبْشِرُونَ بِالَّذِينَ لَمْ يَلْحَقُوا بِهِم مِّنْ خَلْفِهِمْ أَلَّا خَوْفٌ عَلَيْهِمْ وَلَا هُمْ يَحْزَنُونَ ﴿١٧٠﴾ يَسْتَبْشِرُونَ بِنِعْمَةٍ مِّنَ اللَّهِ وَفَضْلٍ وَأَنَّ اللَّهَ لَا يُضِيعُ أَجْرَ الْمُؤْمِنِينَ ﴿١٧١﴾ الَّذِينَ اسْتَجَابُوا لِلَّهِ وَالرَّسُولِ مِن بَعْدِ مَا أَصَابَهُمُ الْقَرْحُ ۚ لِلَّذِينَ أَحْسَنُوا مِنْهُمْ وَاتَّقَوْا أَجْرٌ عَظِيمٌ ﴿١٧٢﴾ الَّذِينَ قَالَ لَهُمُ النَّاسُ إِنَّ النَّاسَ قَدْ جَمَعُوا لَكُمْ فَاخْشَوْهُمْ فَزَادَهُمْ إِيمَانًا وَقَالُوا حَسْبُنَا اللَّهُ وَنِعْمَ الْوَكِيلُ ﴿١٧٣﴾ فَانقَلَبُوا بِنِعْمَةٍ مِّنَ اللَّهِ وَفَضْلٍ لَّمْ يَمْسَسْهُمْ سُوءٌ وَاتَّبَعُوا رِضْوَانَ اللَّهِ ۗ وَاللَّهُ ذُو فَضْلٍ عَظِيمٍ ﴿١٧٤﴾ إِنَّمَا ذَٰلِكُمُ الشَّيْطَانُ يُخَوِّفُ أَوْلِيَاءَهُ فَلَا تَخَافُوهُمْ وَخَافُونِ إِن كُنتُم مُّؤْمِنِينَ ﴿١٧٥﴾﴾

**ڕێزی شەهید**

خودای گەورە باسی شەهید دەکات، ئەگەر لە ژیانی دنیادا کوژران گیانەکانیان زیندووە ڕۆزی ئەدرێن لە ڕۆژی قیامەتدا موسلیم ڕیوایەتی کردووە لە سەحیحەکەیدا لە مەسروقەوە وتی: (پرسیارمان لە عەبدوللای کوڕی مەسعود کرد دەربارەی ئەم ئایەتە: ﴿وَلَا تَحْسَبَنَّ الَّذِينَ قُتِلُوا فِي سَبِيلِ اللَّهِ أَمْوَاتًا ۚ بَلْ أَحْيَاءٌ عِندَ رَبِّهِمْ يُرْزَقُونَ﴾ ئەو کەسانەی لە ڕێی خوادا کوژراون هەرگیز نابێ بە مردوویان هەژمار بکەن، هەر زیندوونو خودا بژێویان دەداتێ. ئەویش وتی: ئێمە پرسیارمان لە پێغەمبەر (ﷺ) کرد، ئەویش فەرمووی: (گیانیان وا لەناو سکی باڵندەیەکی سەوزدا، خاوەنی چەند چرایەکی هەڵواسراوە بە عەرشەوە لە بەهەشتا چەند بیانەوێو بۆ هەر کوێ بیانەوێ دەگەڕێن، پاشان دێنەوە بۆ لای ئەو چرایانە، پەروەردگاریان تەماشەیەکیان دەکاتو ئەفەرموێت: ئایا حەز لە چی دەکەن؟ دەڵێن: حەز بە چی بکەین لە کاتێکا ئێمە بە ئارەزوی خۆمان بۆ کوێ بمانەوێ لە بەهەشتا دەگەڕێین؟ تا سێ جار

[1] الطبري (٣٨٣).

ئەمەیان پێ ئەفەرموێت، کاتێ دەبینن وازیان لێ ناهێنرێ تا داوای شتێ نەکەن، دەڵێن: پەروەردگار، دوات لێدەکەین کە جارێکی تر گیانمان بگەڕێتەوە بۆ لاشەمان تا جارێکی تر لە پێناوی تۆدا بکوژرێین کاتێ دەبینێ هیچ داوایەکیان نیە وازیان لێ دەهێنرێت)[1] ئەم فەرموودەیە بەم شێوەیە ڕیوایەت کراوە لە ئەنەس و ئەبوسەعیدەوە. ئیمامی ئەحمەد ڕیوایەتی کردووە لە ئەنەسەوە کە پێغەمبەری خودا (ﷺ) فەرموویەتی: (هیچ گیانێ نیە کە دەمرێ. چاکەیەکی لەلای خودا هەبێ پێی خۆشبێ بگەڕێتەوە بۆ دنیا جگە لە شەهید. چونکە شەهید پێی خۆشە بگەڕێتەوە تا جارێکی تر بکوژرێ، کاتێ کە ڕێزی شەهیدی دەبینێ) موسلیمش ئەم فەرموودەی هێناوە[2] ئیمامی ئەحمەد ڕیوایەتی کردووە لە ئیبنوعەبباسەوە وتی: پێغەمبەری خودا (ﷺ) فەرموویەتی: (کاتێ کە براکانتان ئەوەیان بەسەرهات لە شەڕی ئوحودا خودای گەورە گیانیانی خستە ناو سنگی باڵندەی سەوزەوە کە بەسەر ڕووبارەکانی بەهەشتەوە دێن و دەچن وە لە بەروبومی باخی بەهەشت دەخۆن و لە چەند چرایەکی بە ئاڵتون دروستکراوی بەر سێبەری عەرشدا دەحەسێنەوە، کاتێك دەبینن خۆشی و تامی ئەو خواردنەی کە دیخۆن و دەیخۆنەوە لەگەڵ ئەو سەرئەنجام و پاشەڕۆژە چاکەیاندا، دەڵێن: خۆزگە براکانمان دەیانزانی کە خودای گەورە چی بۆ ئامادە کردووین و چ ڕێزێکی لێ گرتووین، بۆ ئەوەی وازیان لە جیهادو تێکۆشانەکانیان نەهێنایە لە ڕێگەی خوداو هەرگیز پشتیان لە جەنگ نەکردایە، خودای گەورەش فەرمووی: من ئەمەی ئێوەیان پێ ڕادەگەیەنم، بۆیە خودای گەورە ئەم ئایەتەی ناردە خوارەوە: ﴿وَلَا تَحْسَبَنَّ ٱلَّذِينَ قُتِلُوا۟ فِى سَبِيلِ ٱللَّهِ أَمْوَٰتًۢا ۚ بَلْ أَحْيَآءٌ عِندَ رَبِّهِمْ يُرْزَقُونَ﴾[3] قەتادەو ڕەبیع و زوحاکیش وتیان: ئەم ئایەتە لەسەر شەهیدەکانی ئوحود هاتە خوارەوە[4] ئەبوبەکری کوڕی مەردەوەیهی (مردویە) ڕیوایەتی کردووە لە جابیری کوڕی عەبدوڵلاوە وتی: پێغەمبەری خودا (ﷺ) ڕۆژێ سەیری کردم و فەرمووی: (ئەی جابیر چیە دەت بینم خەمگینی؟) وتی: وتم: ئەی پێغەمبەری خودا (ﷺ) باوکم شەهید بوەو قەرزو ماڵ و منداڵێکی بەجێهێشتوە وتی: پێغەمبەر (ﷺ) فەرمووی: (ئایا هەواڵت بدەمێ کە خودا هەرگیز قسەی لەگەڵ کەسا نەکردووە لە پشتی پەردەوە نەبێ (وراء الحجاب) کەچی ڕووبەڕوو قسەی لەگەڵ باوکت کردووە)، (خوای گەورە فەرموویەتی: داوا بکە تا پێت ببەخشم وتی: داوات لێ دەکەم کە بگەڕێمەوە بۆ دنیا لە ڕێی تۆدا جارێکی تر بکوژرێم. پەروەردگاری مەزنیش ئەفەرموێت: بێگومان من لە پێشا بڕیارم داوە: کە جارێکی تر ناگەڕێنەوە بۆی. وتی: ئەی پەروەندە سا ئاگاداری

---

[1] مسلم (١٥٠٢/٣).

[2] أحمد (١٢٦/٣)، مسلم (١٨٧٧).

[3] أحمد (٢٦٥/١)، فەرموودەیەکی حەسەنە.

[4] الطبري (٣٨٩/٧-٣٩٠).

ئەوانەی لە دوامەوە دێن بکە خودای گەورە ئەم ئایەتەی ناردە خوارەوە: ﴿وَلَا تَحْسَبَنَّ ٱلَّذِينَ قُتِلُوا۟ فِى سَبِيلِ ٱللَّهِ أَمْوَٰتًا﴾[1] ئەوانەی وا لە ڕێی خوادا کوژراون هەرگیز نابێ بە مردوویان بزانن. ئیمامی ئەحمەد ڕیوایەتی کردووە لە ئیبنوعەبباسەوە (ڕەزای خوایان لێ بێت) وتی: پێغەمبەری خودا فەرموویەتی: (شەهیدان لەسەر کەناری ڕووبارێکن لە دەرگای بەهەشتا لە گومەزێکی سەوزدا، بژێویان لە بەهەشتەوە بۆ دێ ئێواران و بەیانیان) تەنیا ئەحمەد خۆی هێناویەتی.[2] ئیبنوجەریریش هێناویەتی[3] ئەم فەرموودە سەنەدەکانی باشن. وەك ئەوەی شەهید چەند بەشێکن: هەیانە گیانەکانیان بەناو بەهەشتا دێت و دەچێ. هەشیانە لەسەر کەناری ئەو ڕووبارەن لە دەرگای بەهەشتا. هەڵیش دەگرێ هاتوچۆکەیان هەتا سەر ئەو ڕووبارە بێ و لەوێ کۆ ببنەوە. لەوێ ڕۆزیەکەیان پێ بدرێت و لەوێ هاتوچۆ بکەن. والله أعلم. لە موسنەدی ئیمامی ئەحمەد فەرموودەیەکمان ڕیوایەت کردووە کە مژدەیە بۆ هەموو موسوڵمانێ کە گیانەکەی وا لەبەهەشتاو گیانەکەی لەناو بەهەشتا دێت و دەڕوات و لە بەروبومەکەی دەخوات، هەرچی بەختەوەری خۆشیە دەیبینێ، ئەوەی خودا بۆی ئامادە کردووە بەچاوی خۆی دەیبینێ لە ڕێز لێ نان، کە فەرموودەکە سەنەدێکی چاك و گەورەی هەیە. سیان لە چوار پێشەواکە هەوران لەسەری، ئیمامی ئەحمەد ڕیوایەتی کردووە لە موحەممەدی کوڕی ئیدریسی شافیعیەوە لە مالیکی کوڕی ئەنەسی ئەسبەحیەوە (ڕەزای خوای لێ بێت) لە زوهریەوە لە عەبدوڕەحمانی کوڕی کەعبی کوڕی مالیکەوە لە باوکیەوە (ڕەزای خوای لێ بێت) وتی: پێغەمبەری خودا (ﷺ) فەرمووی: (گیانی خاوەن باوەڕ باڵندەیەکە بە درەختی بەهەشتەوە هەڵواسراوە هەتا دەگەڕێتەوە بۆ لاشەکەی ئەو ڕۆژەی کە زیندووی دەکاتەوە)[4] وە لەم فەرمودەیەدا: (بێگومان گیانی خاوەن باوەڕ لە شێوەی باڵندەیەکایە لەناو بەهەشتا) بەڵام گیانی شەهیدان وەك لە پێشەوە باس کرا لە سکی باڵندەیەکی سەوزدایە خۆی بە ئارەزوی خۆی دەفڕێت، داوا لە خودای خاوەن منەت دەکەین کە ڕاوەستاومان بکات لەسەر باوەڕ. پاشان خودای گەورە ئەفەرموێت: ﴿فَرِحِينَ بِمَآ ءَاتَىٰهُمُ ٱللَّهُ مِن فَضْلِهِۦ وَيَسْتَبْشِرُونَ بِٱلَّذِينَ لَمْ يَلْحَقُوا۟ بِهِم مِّنْ خَلْفِهِمْ أَلَّا خَوْفٌ عَلَيْهِمْ وَلَا هُمْ يَحْزَنُونَ﴾ دڵیان خۆشە بەو چاکەیە کە خودا دەرباریەی کردوون، شادن بەوەش کە ئەوانەی وا نەگەیشتونە ئەمان و بەجێ ماون هیچ ترسێکیان لەسەر نابێ و هیچ خەمێکیان لەبەر نابێ. واتە: ئەو شەهیدانەی کە لە ڕێی خودا کوژراون لەلای خودا

---

[1] دلائل النبوة للبيهقي (٣/٢٩٩).

[2] أحمد (١/٢٦٦)، فەرموودەیەکی باشە (جيد).

[3] الطبري (٧/٣٨٧).

[4] أحمد (٣/٢٥٥)، سەحیحە.

زیندون و دڵخۆشن بەو بەهرەی کە خودا پێی داون و مژدەیش ئەدەن بەو برانەیان کە دوای ئەوان شەهید دەبن لە ڕێی خوادا و ئەمان پێشیان کەوتون. کە هیچ ترسێکیان نابێ و خەم ناخۆن بەوەی کە تووشیان دێ و خەمیش ناخۆن بۆ ئەوەی کە بەجێیان هێشتوە لە دوای خۆیان (داوای بەهەشت لە خودا دەکەین) لە هەردوو سەحیحەکەدا هاتوە لە ئەنەسەوە (ڕەزای خوای لێ بێت) لە بەسەرهاتی بیری مەعونەدا ئەو حەفتا کەسەی لە ئەنساریەکان کە کوژران لە بەرەبەیانێکا، پێغەمبەری خودا (ﷺ) قونوتی خوێند لەسەر ئەوانەی کە کوشتنیان دوعای لێ دەکردن و بەر نەفرینی (لەعنەتی) دەخستن. ئەنەس وتی: قورئانیش لەسەریان هاتە خوارەوە و پاشان ئەو ئایەتە نەسخ بوەوە. (کە کەس و کارەکانمان لە ئێوە ئاگادار بکەنەوە، کە ئێمە گەیشتینە خزمەت پەروەردگارمان لێمان ڕازی بوە و ڕازیشی کردووین)[1]، پاشان خودای گەورە ئەفەرموێت: ﴿يَسۡتَبۡشِرُونَ بِنِعۡمَةٖ مِّنَ ٱللَّهِ وَفَضۡلٖ وَأَنَّ ٱللَّهَ لَا يُضِيعُ أَجۡرَ ٱلۡمُؤۡمِنِينَ﴾ دڵیان خۆشە بە نیعمەتی خوداو بەو زیادە بەشانەی پێیان دراوە، بەوەش کە خودا پاداشتی باوەڕداران ون ناکات. موحەممەدی کوڕی ئیسحاق وتی: دڵخۆشیان دەردەبڕی کەیف خۆش بوون بەو شتانەی بە چاوی خۆیان دەیاندی کە بەڵێنیان پێدرا بوو لەو پاداشتە زۆرەی کە پێیان درا. عەبدوڕەحمانی کوڕی زەیدی کوڕی ئەسلەم وتی: ئەم ئایەتە گشت خاوەن باوەڕانی کۆ کردۆتەوە، چ شەهیدان و چ غەیرەز شەهیدان. زۆر کەم خودای گەورە باسی ڕشێزی پێغەمبەرانی کردبێ و پاداشتی کردبن، مەگین پاشان باسی پاداشتی خاوەن باوەڕانیشی بەدوایدا هێناوە.

**باسی غەزای ( حمراء الاسد ) و ڕێزی ئەوانەی ئامادەی بوون**

خودای گەورە ئەفەرموێت: ﴿ٱلَّذِينَ ٱسۡتَجَابُواْ لِلَّهِ وَٱلرَّسُولِ مِنۢ بَعۡدِ مَآ أَصَابَهُمُ ٱلۡقَرۡحُۚ لِلَّذِينَ أَحۡسَنُواْ مِنۡهُمۡ وَٱتَّقَوۡاْ أَجۡرٌ عَظِيمٌ﴾ ئەو کەسانەی کە لە پاش بریندار بوونیش فەرمانی خواو پێغەمبەریان بەجێ هێنا بۆ ئەوانیانە وا کاری چاکیان کردو لە خوا ترسان، پاداشتێکی گەورە هەیە. ئەمە لە ڕۆژی (حمراء الاسد) دا بوو، کاتێ کە بت پەرستەکان ئەو دەستەیان لە موسوڵمانەکان وەشاند، کە دەگەڕانەوە بۆ وڵاتی خۆیان، لە ڕێگا کە دەرشۆشتن پەشیمان بوون کە نەیاندا بەسەر مەدینەداو بە تەواوی موسوڵمانەکان لەناوبەرن. کاتێ کە ئەو هەواڵە گەیشتە پێغەمبەری خودا (ﷺ) موسوڵمانانی ئامادە کرد بۆ ڕۆشتن بە دوایاندا بۆ ترساندنیان و تێیان بگەیەنێ کە موسوڵمانان هەر بەهێزو توانان، ڕێگای بە هیچ کەسێ نەدا لەگەڵی بڕوا جگە لەوانەی کە ئامادەی شەڕی ئوحود بوون بێجگە لە جابیری کوڕی عەبدوڵڵا (ڕەزای خوای لێ بێت) وەك لەمەوبەدوا باسی دەکەین. خاوەن باوەڕانی بەو هەموو برینداری و

---

[1] فتح الباري (٧/٤٤٥)، مسلم (١/٤٦٨).

لێ شەهید بونەوە بانگ کرد بۆ گوێڕایەڵی خوداو پێغەمبەرەکەی (ﷺ) ئیبنوئەبی حاتەم ڕیوایەتی کردووە لە عیکرمەوە، وتی: کاتێ کە بت پەرستەکان لە ئوحود گەڕانەوە وتیان: نە موحەممەدتان کوشت و نە کیژەکانیشتان لەگەڵ خۆتان هێنا، چ کارێکی خراپتان کرد. بگەڕێنەوە، پێغەمبەری خودا کە ئەمەی بیست موسوڵمانەکانی ئامادە کردو ڕۆشت بە شوێنیاندا هەتا گەیشتە (حمراء الاسد) یان (بئر أبي عيينة) بت پەرستەکان وتیان: وا چاکە بۆیان بگەڕێینەوە. لەو کاتەدا پێغەمبەر گەڕایەوە بۆیان، ئەم گەڕانەوەیە بە غەزایەك دادەنرێت. خودای گەورە ئەم ئایەتەی ناردە خوارەوە: ﴿ٱلَّذِينَ ٱسْتَجَابُوا۟ لِلَّهِ وَٱلرَّسُولِ مِنۢ بَعْدِ مَآ أَصَابَهُمُ ٱلْقَرْحُ ۚ لِلَّذِينَ أَحْسَنُوا۟ مِنْهُمْ وَٱتَّقَوْا۟ أَجْرٌ عَظِيمٌ﴾[1] بوخاری ڕیوایەتی کردووە لە عائیشەوە (ڕەزای خوای لێ بێت) وتم بە عوروە: ئەی برازای خۆم باوکت یەکێك بوە لەوانە: زوبەیرو ئەبوبەکر (ڕەزای خوایان لێ بێت) کاتێ تووشی ئەوە بوو کە تووشی هات لە ڕۆژی ئوحوداو بت پەرستەکان لێی دوورکەوتنەوە، ترسان جارێکی تر بگەڕێنەوە فەرمووی: (کێ دەگەڕێتەوەو بچێ بە دوایاندا؟ ) حەفتا کەس خۆی ئامادە کرد، ئەبوبەکرو زوبەیریان تیا بوو (ڕەزای خوایان لێ بێت) بوخاری بەم شێوە خۆی ڕیوایەتی کردووە[2] خودای گەورە ئەفەرموێت: ﴿ٱلَّذِينَ قَالَ لَهُمُ ٱلنَّاسُ إِنَّ ٱلنَّاسَ قَدْ جَمَعُوا۟ لَكُمْ فَٱخْشَوْهُمْ فَزَادَهُمْ إِيمَـٰنًا وَقَالُوا۟ حَسْبُنَا ٱللَّهُ وَنِعْمَ ٱلْوَكِيلُ﴾ ئەو کەسانەی پێیان وتن: گەلە کۆمەتان لێکراوە، دەبێ ترستان لێیان هەبێ، باوەڕیان بەهێزتر بوەو وتیان: ئێمە هەر خودامان بێ بەسمانە، چاکترین پشت و پەنامان تەنیا ئەوە. واتە: ئەوانەی کە خەڵکی دەیان ترساندن بە کۆبونەوەی دوژمن بۆیان و دەیان وت: دوژمن هێزێکی زۆری کۆکردۆتەوە بۆتان، هیچ ترسیان لێ نەنیشت و وتیان: ئێمە تەنها خودمان بەسەو چاکترین پشت و پەنایە بۆمان. تەنیا پشتیان بە خوا بەست ﴿وَقَالُوا۟ حَسْبُنَا ٱللَّهُ وَنِعْمَ ٱلْوَكِيلُ﴾ بوخاری ڕیوایەتی کردووە لە ئیبنوعەبباسەوە ﴿حَسْبُنَا ٱللَّهُ وَنِعْمَ ٱلْوَكِيلُ﴾ ئیبراهیم (سەلامی خوای لێ بێت) کاتێ خستیانە ناو ئاگرو موحەممەد (ﷺ) وتی: کاتێ وتیان خەڵکی کۆبونەتەوە بۆتان بۆ ئەوەی بتان ترسێنن بەڵام بڕوایان زیاتر بەهێز بوو، وتیان: تەنیا خوامان بەسەو چاکترین پشت و پەنایە بۆمان.[3] ئەبوبەکری مەردەوەیهی ڕیوایەتی کردووە لە ئەنەسی کوڕی مالیکەوە لە پێغەمبەری خوداوە (ﷺ) کە لە ڕۆژی ئوحودا پێی وترا، کە خەڵکی کۆبونەتەوە بۆتان تا بیان ترسێنن خودای گەورە ئەم ئایەتەی ناردە خوارەوە. هەر بۆیە

---

[1] النسائي في الكبرى (١١٠٨٣)، فەرموودەیەکی مورسەلە، فەرموودەی تر پشتیگیری دەکات.

[2] البخاري (٤٠٧٧).

[3] فتح الباري (٨/٧٧).

خودای گەورە ئەفەرمویت: ﴿فَانقَلَبُوا بِنِعْمَةٍ مِّنَ اللَّهِ وَفَضْلٍ لَّمْ يَمْسَسْهُمْ سُوءٌ وَاتَّبَعُوا رِضْوَانَ اللَّهِ وَاللَّهُ ذُو فَضْلٍ عَظِيمٍ﴾ گەڕانەوە لەگەڵ چاکەی خودادا (بێ ئەوەی تووشی زیان بن) ئەوانە شوێنی ڕەزامەندی خودا کەوتن هەر خودایشە چاکەی گەورەی بەدەستە. واتە: پشتیان هەر بە خوا بەست، تەنیا خودایان بەس بوو کە پشتیوانی لێکردن و لە فێڵ و فڕی بت پەرستان پاراستنی گەڕانەوە بۆ مەدینە. بەیهەقی ڕیوایەتی کردووە لە ئیبنوعەبباسەوە لەم ئایەتەدا ﴿فَانقَلَبُوا بِنِعْمَةٍ مِّنَ اللَّهِ وَفَضْلٍ﴾ دەڵێت: (النعمة) واتە: تووشی هیچ نەهاتن ﴿وَفَضْلٍ﴾ کاروانێك بە لایاندا ڕۆشت لە ڕۆژەکانی مەوسیما بوو (الموسم) پێغەمبەری خودا کاروانەکەی کڕی و قازانجێکی باشی تیا کردو ماڵەکەی دابەش کرد لە نێوان هاوەڵەکانیا.[1] پاشان خودای گەورە ئەفەرمویت: ﴿إِنَّمَا ذَٰلِكُمُ الشَّيْطَانُ يُخَوِّفُ أَوْلِيَاءَهُ﴾ لە ڕاستیدا ئەو شەیتانە وا (دەیەوێ ئێوە) لە هاودەستانی خۆی بترسێنێ. واتە: شەیتان دەیەوێ بە دۆستەکانی خۆی ئێوە بترسێنێ، دەیەوێ وا بزانن کە دوژمنەکەتان خاوەن هێزو توانایە ﴿فَلَا تَخَافُوهُمْ وَخَافُونِ إِن كُنتُم مُّؤْمِنِينَ﴾ ئێوە ترستان لەوان نەبێ. ئەگەر خاوەن باوەڕن دەبێ هەر تەنیا لە من بترسن. واتە: کاتێ شەیتان شتێکی خستە دڵتان پشت و پەناتان هەر من بێ. منتان بەسەو سەرتان دەخەم بەسەر دوژمنـدا. وەك خودای گەورە ئەفەرمویت: ﴿أَلَيْسَ اللَّهُ بِكَافٍ عَبْدَهُ ۖ وَيُخَوِّفُونَكَ بِالَّذِينَ مِن دُونِهِ﴾ هەتا دەگاتە ﴿قُلْ حَسْبِيَ اللَّهُ ۖ عَلَيْهِ يَتَوَكَّلُ الْمُتَوَكِّلُونَ﴾[2] مەگەر هەر خودا بەس نیە کە ئاگای لە عەبدی خۆی هەبێ؟ تۆ بە ئەوانەی غەیرەز خودان دەترسێنێ. هەتا دەگاتە، بڵێ: من هەر خودام بەسەو خۆ سپێران هەر خۆیان بە ئەو دەسپێرن. وە ئەفەرمویت: ﴿فَقَاتِلُوا أَوْلِيَاءَ الشَّيْطَانِ ۖ إِنَّ كَيْدَ الشَّيْطَانِ كَانَ ضَعِيفًا﴾[3] دەسا ئێوە بچنە شەڕی ئەوانەی دۆستی شەیتانن، فێڵی شەیتان زەبوون و بێ هێزو پێزە. وە ئەفەرمویت: ﴿أُولَٰئِكَ حِزْبُ الشَّيْطَانِ ۚ أَلَا إِنَّ حِزْبَ الشَّيْطَانِ هُمُ الْخَاسِرُونَ﴾[4] ئەوانە کۆمەڵی شەیتانن، باش بزانن کە هەر کۆمەڵی شەیتان زیانبارن. وە ئەفەرمویت: ﴿كَتَبَ اللَّهُ

---

[1] دلائل النبوة (٣/٣١٨).

[2] الزمر (٣٦–٣٨).

[3] النساء (٧٦).

[4] المجادلة (١٩).

لَأَغْلِبَنَّ أَنَا وَرُسُلِىٓ إِنَّ ٱللَّهَ قَوِىٌّ عَزِيزٌ ﴾[1] خودا خۆی بڕیاری داوە: بێ گومانە منو پێغەمبەرەکانم سەردەکەوین، خودا توانای بەدەستەڵاتە. وە ئەفەرمویێت: ﴿وَلَيَنصُرَنَّ ٱللَّهُ مَن يَنصُرُهُۥٓ﴾[2] خودا بە هانای ئەوانە دێ کە یارمەتی خودا ئەدەن. وە ئەفەرمویێت: ﴿إِنَّا لَنَنصُرُ رُسُلَنَا وَٱلَّذِينَ ءَامَنُوا۟ فِى ٱلْحَيَوٰةِ ٱلدُّنْيَا وَيَوْمَ يَقُومُ ٱلْأَشْهَـٰدُ ﴿٥١﴾ يَوْمَ لَا يَنفَعُ ٱلظَّـٰلِمِينَ مَعْذِرَتُهُمْ ۖ وَلَهُمُ ٱللَّعْنَةُ وَلَهُمْ سُوٓءُ ٱلدَّارِ﴾[3] بێگومان ئێمە پێغەمبەرانمانو ئەو کەسانەی کەوا بڕوایان هێنلوە لە ژیانی ئەم دنیایەو لەو ڕۆژەشدا کە شایەتەکان ڕاست دەبنەوە یارمەتی ئەدەین. ئەو ڕۆژە کە ستەمکاران پاکانەیان سودێکیان پێ ناگەیەنێو گشتیان بە نەعلەت کراونو خراپترینماڵیان هەیە.

﴿وَلَا يَحْزُنكَ ٱلَّذِينَ يُسَـٰرِعُونَ فِى ٱلْكُفْرِ ۚ إِنَّهُمْ لَن يَضُرُّوا۟ ٱللَّهَ شَيْـًٔا ۗ يُرِيدُ ٱللَّهُ أَلَّا يَجْعَلَ لَهُمْ حَظًّا فِى ٱلْـَٔاخِرَةِ ۖ وَلَهُمْ عَذَابٌ عَظِيمٌ ﴿١٧٦﴾ إِنَّ ٱلَّذِينَ ٱشْتَرَوُا۟ ٱلْكُفْرَ بِٱلْإِيمَـٰنِ لَن يَضُرُّوا۟ ٱللَّهَ شَيْـًٔا وَلَهُمْ عَذَابٌ أَلِيمٌ ﴿١٧٧﴾ وَلَا يَحْسَبَنَّ ٱلَّذِينَ كَفَرُوٓا۟ أَنَّمَا نُمْلِى لَهُمْ خَيْرٌ لِّأَنفُسِهِمْ ۚ إِنَّمَا نُمْلِى لَهُمْ لِيَزْدَادُوٓا۟ إِثْمًا ۚ وَلَهُمْ عَذَابٌ مُّهِينٌ ﴿١٧٨﴾ مَّا كَانَ ٱللَّهُ لِيَذَرَ ٱلْمُؤْمِنِينَ عَلَىٰ مَآ أَنتُمْ عَلَيْهِ حَتَّىٰ يَمِيزَ ٱلْخَبِيثَ مِنَ ٱلطَّيِّبِ ۗ وَمَا كَانَ ٱللَّهُ لِيُطْلِعَكُمْ عَلَى ٱلْغَيْبِ وَلَـٰكِنَّ ٱللَّهَ يَجْتَبِى مِن رُّسُلِهِۦ مَن يَشَآءُ ۖ فَـَٔامِنُوا۟ بِٱللَّهِ وَرُسُلِهِۦ ۚ وَإِن تُؤْمِنُوا۟ وَتَتَّقُوا۟ فَلَكُمْ أَجْرٌ عَظِيمٌ ﴿١٧٩﴾ وَلَا يَحْسَبَنَّ ٱلَّذِينَ يَبْخَلُونَ بِمَآ ءَاتَىٰهُمُ ٱللَّهُ مِن فَضْلِهِۦ هُوَ خَيْرًا لَّهُم ۖ بَلْ هُوَ شَرٌّ لَّهُمْ ۖ سَيُطَوَّقُونَ مَا بَخِلُوا۟ بِهِۦ يَوْمَ ٱلْقِيَـٰمَةِ ۗ وَلِلَّهِ مِيرَٰثُ ٱلسَّمَـٰوَٰتِ وَٱلْأَرْضِ ۗ وَٱللَّهُ بِمَا تَعْمَلُونَ خَبِيرٌ ﴿١٨٠﴾﴾

### دڵدانەوەیە بۆ پێغەمبەر (ﷺ)

خودای گەورە ئەفەرمویێت بە پێغەمبەرەکەی: ﴿وَلَا يَحْزُنكَ ٱلَّذِينَ يُسَـٰرِعُونَ فِى ٱلْكُفْرِ﴾ لەوانە نیگەران مەبە کە بە پەلە لە دژی دین تێدەکۆشن. واتە: ئەوە لەبەر زۆر بەتەنگەوە بوونی پێغەمبەرە (ﷺ) بۆ خەڵکی، کە نیگەران بووە لە هەوڵدانی خوانەناسان بۆ دژایەتی کردنو سەرپێچی کردنو ناکۆکی خستنەوە. خودای گەورە ئەفەرمویێت هیچ دلگران مەبە لەوە ﴿إِنَّهُمْ لَن يَضُرُّوا۟ ٱللَّهَ شَيْـًٔا ۗ يُرِيدُ ٱللَّهُ أَلَّا يَجْعَلَ لَهُمْ حَظًّا فِى ٱلْـَٔاخِرَةِ﴾ ئەوانە ناتوانن هیچ زیانێك لە خوا بدەن خوا دەیەوێ کە ئەوانە لەو دنیا هیچ بەشێکیان نەبێ. واتە: خودا لە کارزانە بەرانبەریان دەیەوێ بە ویستو دەستەڵاتی خۆی هیچ

---

[1] المجادلة (٢١).

[2] الحج (٤٠).

[3] غافر (٥١-٥٢).

بەشێکیان نەبێ لە ڕۆژی قیامەتدا ﴿وَلَهُمۡ عَذَابٌ عَظِيمٌ﴾ تووشی سزای دژوار دەبن. پاشان خودای گەورە لەو بارەیەوە ئەفەرموێت: ﴿إِنَّ ٱلَّذِينَ ٱشۡتَرَوُاْ ٱلۡكُفۡرَ بِٱلۡإِيمَٰنِ لَن يَضُرُّواْ ٱللَّهَ شَيۡـٔٗا وَلَهُمۡ عَذَابٌ أَلِيمٞ﴾ ئەو کەسانەی لە باتی بڕوا بە خوا بێ بڕوایی هەڵدەبژێرن، هیچ زیان لە خوا نادەن و جەزرەبەی بەژانیان دەبێ. پاشان خودای گەورە ئەفەرموێت: ﴿وَلَا يَحۡسَبَنَّ ٱلَّذِينَ كَفَرُوٓاْ أَنَّمَا نُمۡلِي لَهُمۡ خَيۡرٞ لِّأَنفُسِهِمۡۚ إِنَّمَا نُمۡلِي لَهُمۡ لِيَزۡدَادُوٓاْ إِثۡمٗاۖ وَلَهُمۡ عَذَابٞ مُّهِينٞ﴾ با ئەوانەی خوانەناسن وا بیر نەکەنەوە، ئەو مۆڵەتەی دەیاندەینێ چاکە بۆیان، هەر بۆیە مۆڵەتیان ئەدەینێ تا تاوانیان زۆرتر بێ، ئازارێکی ئابڕو بەریش بەشیان دەبێ. ئەم ئایەتە وەك ئەو ئایەتە وایە کە خودای گەورە ئەفەرموێت: ﴿أَيَحۡسَبُونَ أَنَّمَا نُمِدُّهُم بِهِۦ مِن مَّالٖ وَبَنِينَ ٥٥ نُسَارِعُ لَهُمۡ فِي ٱلۡخَيۡرَٰتِۚ بَل لَّا يَشۡعُرُونَ﴾[1] ئایا ئەوان پێیان وایە ئێمە کە بە ماڵ و کوڕان یارمەتیان ئەدەین، هەر بۆ ئەوەیە کە: پەلەمانە لە چاکەکردن لەگەڵیان؟ نەخێر ئەمانە نازانن. وەك ئەم ئایەتەیش کە ئەفەرموێت: ﴿فَذَرۡنِي وَمَن يُكَذِّبُ بِهَٰذَا ٱلۡحَدِيثِۖ سَنَسۡتَدۡرِجُهُم مِّنۡ حَيۡثُ لَا يَعۡلَمُونَ﴾[2] تۆ من بێڵە بۆ ئەوانەی بەم قورئانە بڕوا ناکەن کەم کەم بۆیان شل دەکەین کە هەر خۆشیان هەستی پێ ناکەن. وەك ئەم ئایەتەیش کە ئەفەرموێت: ﴿وَلَا تُعۡجِبۡكَ أَمۡوَٰلُهُمۡ وَأَوۡلَٰدُهُمۡۚ إِنَّمَا يُرِيدُ ٱللَّهُ أَن يُعَذِّبَهُم بِهَا فِي ٱلدُّنۡيَا وَتَزۡهَقَ أَنفُسُهُمۡ وَهُمۡ كَٰفِرُونَ﴾[3] داهات و منداڵی زۆریان بە لاتەوە گرنگ نەبێ، خودا دەیەوێ هەر بەمانە لە دنیا جەزرەبەیان داو بە بێ دینی گیانیان دەرچێ. پاشان خودای گەورە لێرەدا ئەفەرموێت: ﴿وَلَا يَحۡسَبَنَّ ٱلَّذِينَ كَفَرُوٓاْ أَنَّمَا نُمۡلِي لَهُمۡ خَيۡرٞ لِّأَنفُسِهِمۡۚ إِنَّمَا نُمۡلِي لَهُمۡ لِيَزۡدَادُوٓاْ إِثۡمٗاۖ وَلَهُمۡ عَذَابٞ مُّهِينٞ﴾ خودا هیچ کاتێ لە بارودۆخێکا نەهێشتۆتەوە مەگەر لەبەر ئەوەی ناپاکان لە پاکان هەڵاوێرێ وە دەبێ هۆکارێ دروس بکات و تاقیتان بکاتەوە هەتا دۆستەکانی دەرکەوێ و دوژمنەکانی ئابڕو بەرێ و خاوەن باوەڕی خۆڕاگرو دووڕووی لە ڕێ لادەری تیا دەربخات. مەبەس پێی ڕۆژی ئوحودە کە خودا موسوڵمانانی پێ تاقی کردەوە. بڕواو خۆڕاگری و لێبڕاوی گوێڕایەڵیان دەرکەوێ بۆ خوداو پێغەمبەرەکەی (ﷺ) ئەوەی دووڕووەکان شاردبویانەوە پێی ئابڕو بەرێ، خەیانەت و خۆدزینەوە و سەرپێچیان لەو ڕۆژەدا دەرکەوێ بۆ خوداو پێغەمبەرەکەی (ﷺ) هەر بۆیە خودای گەورە ئەفەرموێت: ﴿وَلَا يَحۡسَبَنَّ ٱلَّذِينَ كَفَرُوٓاْ أَنَّمَا نُمۡلِي لَهُمۡ خَيۡرٞ لِّأَنفُسِهِمۡۚ إِنَّمَا نُمۡلِي لَهُمۡ لِيَزۡدَادُوٓاْ إِثۡمٗاۚ

---

[1] المؤمنون (٥٥-٥٦).

[2] القلم (٤٤).

[3] التوبة (٨٥).

﴿وَلَهُمْ عَذَابٌ مُّهِينٌ﴾ خودا هیچ کاتێ لە بارودۆخێکدا (وا ئێوە هەن) نەهێشتۆتەوە مەگەر لەبەر ئەوەی ناپاکان لە پاکان جیا بکاتەوە. موجاهید وتی: لە ڕۆژی ئوحودا خودا ناپاکانی لە پاکان هەڵاوێرا.[1] قەتادە وتی: بە جیهادو کۆچ کردن لە یەکتری جیا کردنەوە[2] پاشان خودای گەورە ئەفەرموێت: ﴿وَمَا كَانَ ٱللَّهُ لِيُطْلِعَكُمْ عَلَى ٱلْغَيْبِ﴾ خودا ئێوە لە نادیار ئاگادار ناکات. واتە: ئێوە لە شتە نهێنیەکانی خودا ئاگادار نین لەناو دروس کراوەکانیا هەتا خاوەن باوەڕو دووڕووتان بۆ جیا بکاتەوە، بە ڕووداوێکی ئاوا نەبێ کە دەردەکەوێ‌و ئاشکرا دەبێ. پاشان ئەفەرموێت: ﴿وَلَٰكِنَّ ٱللَّهَ يَجْتَبِى مِن رُّسُلِهِۦ مَن يَشَآءُ﴾ بەڵام خودا لەناو پێغەمبەرەکانیا کێی بوێ هەڵیدەبژێرێ. وەك لە ئایەتێکی تردا ئەفەرموێت: ﴿عَٰلِمُ ٱلْغَيْبِ فَلَا يُظْهِرُ عَلَىٰ غَيْبِهِۦٓ أَحَدًا ﴿٢٦﴾ إِلَّا مَنِ ٱرْتَضَىٰ مِن رَّسُولٍ فَإِنَّهُۥ يَسْلُكُ مِنۢ بَيْنِ يَدَيْهِ وَمِنْ خَلْفِهِۦ رَصَدًا﴾[3] لە تەیاران ئاگادارەو نهێنی خۆی بۆ کەسێ ئاشکرا ناکات. مەگین بۆ ڕاسپاردەیەکی لێی ڕازی بێ، ئەوسا لە پێش‌و پاشیەوە پاسەوان بەڕێ دەکات. پاشان ئەفەرموێت: ﴿فَـَٔامِنُوا۟ بِٱللَّهِ وَرُسُلِهِۦ﴾ دەبێ ئێوە بڕواتان بە خواو پێغەمبەرەکانی ببێ. واتە: گوێڕایەڵی خوداو پێغەمبەرەکەی بن‌و شوێنی پەیامەکەی بکەون ﴿وَإِن تُؤْمِنُوا۟ وَتَتَّقُوا۟ فَلَكُمْ أَجْرٌ عَظِيمٌ﴾ ئەگەر باوەڕتان هێناو خۆشتان پاراست، پاداشتێکی یەکجار گەورەتان دەدرێتێ.

## زەمی چرووکی‌و هەڕەشە لەسەری

خودای گەورە ئەفەرموێت: ﴿وَلَا يَحْسَبَنَّ ٱلَّذِينَ يَبْخَلُونَ بِمَآ ءَاتَىٰهُمُ ٱللَّهُ مِن فَضْلِهِۦ هُوَ خَيْرًا لَّهُم ۖ بَلْ هُوَ شَرٌّ لَّهُمْ﴾ ئەوانەی چنۆکی دەکەن لەو بەشەی خودا پێیداون، خەیاڵ نەکەن ئەم کارە بۆ ئەوان قازانجە، بەڵکو بۆ خۆیان خراپە. واتە: با مرۆڤی چروك وانەزانێ کۆکردنەوەی سامان سوودی پێ دەگەیەنێ، بەڵکو ئەو سامانە زیانی هەیە بۆ دینی، وە لەوانەشە هەر لە دنیا تووشی زیانی بکات. پاشان خودای گەورە ئاگاداری دەکات کە تووشی چی دەبێ بەهۆی ئەو سامانەوە لە ڕۆژی قیامەتداو ئەفەرموێت: ﴿سَيُطَوَّقُونَ مَا بَخِلُوا۟ بِهِۦ يَوْمَ ٱلْقِيَٰمَةِ﴾ ڕۆژی قیامەت دەبێتە تەوق لە ملیاندایە. بوخاری ڕیوایەتی کردووە لە ئەبوهورەیرەوە وتی: پێغەمبەری خودا (ﷺ) فەرموویەتی: (کەسێ خوا ماڵی پێ ببەخشێ‌و زەکاتی لێ دەرنەکات، خودای گەورە لە ڕۆژێ ئەو ماڵە دەکاتە هەژدیهایەکی سەر ڕوتاوە

---

[1] الطبري (٧/٤٢٤).

[2] الطبري (٧/٢٢٤).

[3] الجن (٢٦-٢٧).

(لەبەر زۆری ژارەکەی) دوو کەڵبەی هەیە بۆ پێوەدان، یان دوو شاخی هەیە دەیئاڵێنێ لە گەردنی‌و پێوەی دەدات، پاشان کەلاوەکانی دەگرێت دەڵێن من ئەو ماڵەی تۆم من گەنجینەکەی تۆم) پاشان ئەم ئایەتەی خوێندەوە: ﴿وَلَا يَحْسَبَنَّ الَّذِينَ يَبْخَلُونَ بِمَآ ءَاتَىٰهُمُ اللَّهُ مِن فَضْلِهِۦ هُوَ خَيْرًا لَّهُم بَلْ هُوَ شَرٌّ لَّهُمْ﴾ تا کۆتایی ئایەتەکە[1] تەنیا بوخاری ئەم فەرموودەی هێناوە، موسلیمی لەگەڵا نیە، بەم شێوەیە. ئیبنوحبانیش هێناویەتی[2] ئیمامی ئەحمەد ڕیوایەتی کردووە لە عەبدوڵڵاوە لە پێغەمبەرەوە (ﷺ) فەرموویەتی: (هیچ عەبدێ نیە کە زەکاتی ماڵی نەدات، مەگین هەژدیهایەکی سەر ڕووتاوە شوێنی دەکەوێ، ئەو لە دەستی ڕا دەکات‌و ئەویش هەر شوێنی دەکەوێ‌و پێی دەڵێ من گەنجینەکەی تۆم) پاشان عەبدوڵلا بۆ ڕاستی‌و پشتگیری ئەم فەرموودەیە ئەم ئایەتەی خوێندەوە: ﴿سَيُطَوَّقُونَ مَا بَخِلُوا۟ بِهِۦ يَوْمَ الْقِيَـٰمَةِ﴾[3] هەر بەم شێوەیە تیرمیزی‌و نەسائی‌و ئیبنوماجە ڕیوایەتیان کردووە[4] پاشان تیرمیزی وتی: فەرموودەیەکی حەسەنی سەحیحە. پاشان خودای گەورە ئەفەرموێت: ﴿وَلِلَّهِ مِيرَٰثُ السَّمَـٰوَٰتِ وَالْأَرْضِ﴾ با بزانن لە (ئاسمانان‌و زەمین هەر بۆ خودا دەمێنێتەوە. وە هەموو شتێ لە کۆتایدا دەگەڕێتەوە بۆ لای خودا. کەوایە لەو سامانەتان پێش خۆتان بخەن کە سوودتان پێدەگەیەنێ لە ڕۆژی قیامەتدا ﴿وَاللَّهُ بِمَا تَعْمَلُونَ خَبِيرٌ﴾ خودا لە هەر کارێ دەیکەن ئاگادارە‌و ئەوەی لەناو دڵتاندایە دەیزانێ.

﴿لَّقَدْ سَمِعَ اللَّهُ قَوْلَ الَّذِينَ قَالُوٓا۟ إِنَّ اللَّهَ فَقِيرٌ وَنَحْنُ أَغْنِيَآءُ ۘ سَنَكْتُبُ مَا قَالُوا۟ وَقَتْلَهُمُ الْأَنۢبِيَآءَ بِغَيْرِ حَقٍّ وَنَقُولُ ذُوقُوا۟ عَذَابَ الْحَرِيقِ ﴿١٨١﴾ ذَٰلِكَ بِمَا قَدَّمَتْ أَيْدِيكُمْ وَأَنَّ اللَّهَ لَيْسَ بِظَلَّـٰمٍ لِّلْعَبِيدِ ﴿١٨٢﴾ الَّذِينَ قَالُوٓا۟ إِنَّ اللَّهَ عَهِدَ إِلَيْنَآ أَلَّا نُؤْمِنَ لِرَسُولٍ حَتَّىٰ يَأْتِيَنَا بِقُرْبَانٍ تَأْكُلُهُ النَّارُ ۗ قُلْ قَدْ جَآءَكُمْ رُسُلٌ مِّن قَبْلِى بِالْبَيِّنَـٰتِ وَبِالَّذِى قُلْتُمْ فَلِمَ قَتَلْتُمُوهُمْ إِن كُنتُمْ صَـٰدِقِينَ ﴿١٨٣﴾ فَإِن كَذَّبُوكَ فَقَدْ كُذِّبَ رُسُلٌ مِّن قَبْلِكَ جَآءُو بِالْبَيِّنَـٰتِ وَالزُّبُرِ وَالْكِتَـٰبِ الْمُنِيرِ ﴿١٨٤﴾﴾

---

[1] فتح الباري (٧٨/٨).

[2] إبن حبان (١٠٧/٥)، سەحیحە.

[3] أحمد (٣٧٧/١)، فەرموودەیەکی سەحیحە.

[4] تحفة الاحوذي (٣٩٣/٨)، النسائي في الكبرى (٣١٧/٦)، إبن ماجة (٥٦٨/٢)، سەحیحە.

## هەڕەشەی خودا لە بت پەرستان

سەعیدی کوڕی جوبویر وتی لە ئیبنوعەبباسەوە وتی: کاتێ ئەم ئایەتە هاتە خوارەوە کە خودای گەورە ئەفەرموێت: ﴿مَن ذَا ٱلَّذِى يُقْرِضُ ٱللَّهَ قَرْضًا حَسَنًا فَيُضَٰعِفَهُۥ لَهُۥٓ أَضْعَافًا كَثِيرَةً﴾[1] کێ مالی خۆی بە دەستە قەرز ئەدا بە خوا، هەتا ئەویش چەند ئەوەندەی بداتەوە؟ جوولەکەکان وتیان: ئەی موحەممەد (ﷺ) پەروەردگارت هەژاری ڕووی تێکردووە داوای قەرز لە عەبدەکانی دەکات؟ خودای گەورە ئەم ئایەتەی ناردە خوارەوە: ﴿لَّقَدْ سَمِعَ ٱللَّهُ قَوْلَ ٱلَّذِينَ قَالُوٓا۟ إِنَّ ٱللَّهَ فَقِيرٌ وَنَحْنُ أَغْنِيَآءُ﴾ خودا وتەی ئەوانەی بیست کە دەیانوت: خودا هەژارەو ئێمە دەولەمەندین. ئیبنومەردەوەیهی ڕیوایەتی کردووە لە ئیبنوئەبی حاتەمەوە. پاشان ئەفەرموێت: ﴿سَنَكْتُبُ مَا قَالُوا۟ وَقَتْلَهُمُ ٱلْأَنۢبِيَآءَ بِغَيْرِ حَقٍّ﴾ وا ئێمە ئەو گفتەیان بە ناهەق کوشتنی پێغەمبەرانیان بۆ تۆمار دەکەین. ئەمە هەڕەشەیەکی زۆر توندە لێیان کە دەڵێن خودا هەژارەو ئەوەش کردارو مامەڵەیانە لەگەڵ پێغەمبەرانداو دەیان کوژن خودای گەورە بەو زوانە سزای سەختو گرانیان ئەدات هەر بۆیە ئەفەرموێت: ﴿وَنَقُولُ ذُوقُوا۟ عَذَابَ ٱلْحَرِيقِ ﴿١٨١﴾ ذَٰلِكَ بِمَا قَدَّمَتْ أَيْدِيكُمْ وَأَنَّ ٱللَّهَ لَيْسَ بِظَلَّامٍ لِّلْعَبِيدِ﴾ دەڵێین: سا بچێژن دەردی بە ئاگر سووتان. چونکە ئێوە ئەو جۆرە کارانەتان دەکرد، خودا هەرگیز غەدر لە عەبدی خۆی ناکات. ئەمەیان بۆ سەرزەنشتو سوکایەتی پێکردنو کەم سەیر کردن پێدەوترێ. وە خودای گەورە ئەفەرموێت: ﴿ٱلَّذِينَ قَالُوٓا۟ إِنَّ ٱللَّهَ عَهِدَ إِلَيْنَآ أَلَّا نُؤْمِنَ لِرَسُولٍ حَتَّىٰ يَأْتِيَنَا بِقُرْبَانٍ تَأْكُلُهُ ٱلنَّارُ﴾ ئەوانە وتیان: لە خوداوە پەیمان سپێرراوە کە باوەڕ بە هیچ پێغەمبەرێك نەکەین. مەگین ئەوەی بە حەیوانێکی قوربانیەوە بێتە لامان، ئاگر بیخوا. خودای گەورە دیسان لێرەدا ئەوانە بە درۆ دەخاتەوە کە وتویانە خودا بەڵێنی پێداون لە کتێبەکەیاندا بڕوا بە هیچ پێغەمبەرێ نەکەن هەتا یەکێك لە موعجیزەکان ئەوە نەبێ کە کەسێ لە ئوممەتەکەی قوربانیەك نەکاتو لێی وەرگیرێو ئاگرێك لە ئاسمانەوە بێتە خوارەوە بیخوات. ئیبنوعەبباسو حەسەنو کەسانی تریش وتویانە. خودای گەورە ئەفەرموێت: ﴿قُلْ قَدْ جَآءَكُمْ رُسُلٌ مِّن قَبْلِى بِٱلْبَيِّنَٰتِ وَبِٱلَّذِى قُلْتُمْ فَلِمَ قَتَلْتُمُوهُمْ إِن كُنتُمْ صَٰدِقِينَ﴾ بڵێ: ئایا بۆچی پێغەمبەرەکانی پێش من چەند نیشانەی ئاشکرایان بۆ هێناونو ئەوەی ئێوە ئێستاش داوای دەکەن کردیان کەچی ئێوە کوشتتانن ئەگەر ئێوە ڕاست دەکەن؟ واتە: بۆچی بڕواتان پێ نەکردنو دژایەتیتان دەکردنو دەتان کوشتن ئەگەر ئێوە ڕاست دەکەن شوێنی پێغەمبەران

---

[1] البقرة (٢٤٥).

دەکەون و لە هەق لانادەن؟ پاشان خودای گەورە دڵخۆشی پێغەمبەر (ﷺ) ئەداتەوەو ئەفەرموێت:

﴿فَإِن كَذَّبُوكَ فَقَدْ كُذِّبَ رُسُلٌ مِّن قَبْلِكَ جَآءُو بِٱلْبَيِّنَٰتِ وَٱلزُّبُرِ وَٱلْكِتَٰبِ ٱلْمُنِيرِ﴾ هەروەك بڕوا بە تۆ ناكەن، لە پێغەمبەرانی پێش تۆش حاشایان كرد. هەرچەندە بە بەڵگەی ئاشكراو نووسراوی زۆرو كتێبی ڕوونكەرەوەوە هاتنە لاتان. واتە: بڕوا نەهێنانی ئەوانە هیچ دڵگرانت نەكات تۆش چاو لەو پێغەمبەرانەی پێش خۆت بكە كەئەوهەموو نیشانانەیان بۆ هات هەر بڕوایان پێنەكردن ﴿وَٱلزُّبُرِ﴾ ئەم هەموو نامانەیان لە ئاسمانەوە ﴿وَٱلْكِتَٰبِ ٱلْمُنِيرِ﴾ لەگەڵ ئەو كتێبە ڕوونكەرەوانەدا بۆ هات هەر بڕوایان پێ نەكردن.

﴿كُلُّ نَفْسٍ ذَآئِقَةُ ٱلْمَوْتِ ۗ وَإِنَّمَا تُوَفَّوْنَ أُجُورَكُمْ يَوْمَ ٱلْقِيَٰمَةِ ۖ فَمَن زُحْزِحَ عَنِ ٱلنَّارِ وَأُدْخِلَ ٱلْجَنَّةَ فَقَدْ فَازَ ۗ وَمَا ٱلْحَيَوٰةُ ٱلدُّنْيَآ إِلَّا مَتَٰعُ ٱلْغُرُورِ ﴿١٨٥﴾ ۞ لَتُبْلَوُنَّ فِىٓ أَمْوَٰلِكُمْ وَأَنفُسِكُمْ وَلَتَسْمَعُنَّ مِنَ ٱلَّذِينَ أُوتُوا۟ ٱلْكِتَٰبَ مِن قَبْلِكُمْ وَمِنَ ٱلَّذِينَ أَشْرَكُوٓا۟ أَذًى كَثِيرًا ۚ وَإِن تَصْبِرُوا۟ وَتَتَّقُوا۟ فَإِنَّ ذَٰلِكَ مِنْ عَزْمِ ٱلْأُمُورِ ﴿١٨٦﴾﴾

**هەموو كەسێ تامی مردن دەچێژێ**

خودای گەورە هەواڵێكی سەرانسەری بڵاو دەكاتەوە هەموو گیانێ لە بونەوەردا دەگرێتەوە كە دەبێ هەموو گیانێ تامی مردن بچێژێو ئەفەرموێت: ﴿كُلُّ نَفْسٍ ذَآئِقَةُ ٱلْمَوْتِ﴾ هەموو كەسێك تامی مردن دەچێژێت. ﴿كُلُّ مَنْ عَلَيْهَا فَانٍ ﴿٢٦﴾ وَيَبْقَىٰ وَجْهُ رَبِّكَ ذُو ٱلْجَلَٰلِ وَٱلْإِكْرَامِ﴾[1] هەركەسێ ژینی لەسەر زەمینە نامێنێ. هەر خودای خاوەن شكۆی بەرزو بەڕێزت دەمێنێ. هەر خودا خۆی زیندوەو نامرێ. جنۆكەو مرۆڤ هەموو دەمرن. فریشتەكان و هەڵگرانی عەرشیش هەر دەمرن. هەر خودای تاك و تەنیا دەمێنێتەوەو نامرێ هەر بوەو هەر دەمێنێ، ئەم ئایەتە پرسەو سەرخۆشی كردنە لە هەموو خەڵك، چونكە هیچ كەسێ لەسەر ڕووی زەمین نامێنێ هەر دەبێ بمرێت. بەپێی ئەو ماوەیە كە بۆی دوایی دێت و تەواو دەبێ و ئەو تنۆكە ئاوەی كە بڕیاری داوە كە تەواو ببێ لە پشتی ئادەما. كەسێ نامێنێ و ڕۆژی قیمەت دێت. هەموو دروس كراوەكان پاداشتی چاكەو خراپەی خۆیان وەردەگرن چ زۆر چ كەم بچوك یا گەورە، هیچ كەس بە ئەندازەی مسقاڵە زەڕەیەك ناهەقی لێ ناكرێ. هەر بۆیە خودای گەورە ئەفەرموێت: ﴿وَإِنَّمَا تُوَفَّوْنَ أُجُورَكُمْ يَوْمَ ٱلْقِيَٰمَةِ﴾ ڕۆژی قیامەت هەقی خۆتان دەنێنە مشت.

---

[1] الرحمن (٢٦-٢٧).

**بەختەوەری و سەرکەوتن بۆ کێیە؟**

خودای گەورە ئەفەرموێت: ﴿فَمَن زُحۡزِحَ عَنِ ٱلنَّارِ وَأُدۡخِلَ ٱلۡجَنَّةَ فَقَدۡ فَازَ﴾ کێ لە ئاگر کلاکری و ببرێتە ناو بەهەشتەوە، دەبیاتەوەو بەختەوەرە. واتە: هەرکەسێ لە ئاگر دوورکەوتەوەو ڕزگاری بوو لێی و خرایە ناو بەهەشتەوە زۆر سەرکەوتوو بەختەوەرە. ئیبنوئەبی حاتەم ڕیوایەتی کردووە لە ئەبوهورەیرەوە وتی: پێغەمبەری خودا (ﷺ) فەرموویەتی: (شوێنی قەمچیەك لەناو بەهەشتا چاکترە لە دنیاو ئەوەی کە تیایەتی، ئەگەر حەزتان کرد ئەم ئایەتە بخوێننەوە: ﴿فَمَن زُحۡزِحَ عَنِ ٱلنَّارِ وَأُدۡخِلَ ٱلۡجَنَّةَ فَقَدۡ فَازَ﴾) ئەم فەرموودەیە لە هەردوو سەحیحەکەدا هاتووە. بە شێوەیەکی تر بەبێ ئەم زیادەیە[1] ئەبوحاتەمی کوڕی حبان ڕیوایەتی کردووە بەم زیادەیەوە لە سەحیحەکەیا[2] حاکمیش لە موستەدرەکەیدا[3] پاشان خودای گەورە ئەفەرموێت: ﴿وَمَا ٱلۡحَيَوٰةُ ٱلدُّنۡيَآ إِلَّا مَتَٰعُ ٱلۡغُرُورِ﴾ ئەم ژیانەی دنیا تەنیا شوێنی فریوە. ئەمە بە کەم سەیرکردنی دنیایە، کە زۆر بێ نرخەو هەر کۆتایی ژیان دێت تێیداو خۆیشی نامێنێ و لەناودەچێ. وەك خودای گەورە لە ئایەتێکی تردا ئەفەرموێت: ﴿بَلۡ تُؤۡثِرُونَ ٱلۡحَيَوٰةَ ٱلدُّنۡيَا ١٦ وَٱلۡأٓخِرَةُ خَيۡرٞ وَأَبۡقَىٰٓ﴾[4] بەلام ئێوە ژیانی دنیا هەڵدەبژێرن. کەچی ڕۆژی قیامەت باشترو پایەدارترە وە ئەفەرموێت: ﴿وَمَآ أُوتِيتُم مِّن شَيۡءٖ فَمَتَٰعُ ٱلۡحَيَوٰةِ ٱلدُّنۡيَا وَزِينَتُهَاۚ وَمَا عِندَ ٱللَّهِ خَيۡرٞ وَأَبۡقَىٰٓۚ﴾[5] ئەوەی بە ئێوە دراوە هەر مایەی گوزەرانتانە لە دنیاداو خۆشیەتی. ئەوەیش کە لەلای خودایە چاکترو زۆرتر دەمێنێ. وە لەم فەرموودەیەدا هاتووە: (سوێند بە خوا دنیا لە چاو دواڕۆژدا هیچ نیە، مەگەر ئەمەندە نەبێ کە یەکێك لە ئێوە ئەم پەنجەی بکات بەناو دەریادا، پاشان سەیر بکات بزانێ چەندە ئاو دەگرێتە خۆی)[6] قەتادە لەم ئایەتەدا ﴿وَمَا ٱلۡحَيَوٰةُ ٱلدُّنۡيَآ إِلَّا مَتَٰعُ ٱلۡغُرُورِ﴾ وتی: دنیا ئارەزوویەکی فریودەرەو بەجێ ماوە. سوێند بەو خودای کە هیچ پەرستراوێ نیە جگە لەو (بە خۆیی و ئەویش لەناوبایەتی لەناودەچن، کەوایە لەو گوزەرانە بۆ خواپەرستی هەڵگرن ئەگەر دەتوانن، هیچ تواناو دەستەلاتێ نیە جگە لە تواناو دەستەلاتی خودا.

---

[1] فتح الباري (٦/١٠٠).

[2] إبن حبان (٩/٢٥٢)، سەحیحە.

[3] الحاکم (٢/٢٩٩)، سەحیحە.

[4] الاعلی (١٦-١٧).

[5] القصص (٦٠).

[6] مسلم (٢٨٥٨)، الترمیذي (٢٣٢٤).

**خاوەن باوەڕ تاقی دەکرێتەوەو قسەی ناخۆشیش لە دوژمنەوە دەبیسن**

خودای گەورە ئەفەرموێت: ﴿لَتُبْلَوُنَّ فِىٓ أَمْوَٰلِكُمْ وَأَنفُسِكُمْ﴾ ئێوە لە گیانو دارایتانا تووشی تاقیکردنەوە دەبن. وەك لە ئایەتێکی تردا خودای گەورە ئەفەرموێت: ﴿ وَلَنَبْلُوَنَّكُم بِشَىْءٍ مِّنَ ٱلْخَوْفِ وَٱلْجُوعِ وَنَقْصٍ مِّنَ ٱلْأَمْوَٰلِ وَٱلْأَنفُسِ وَٱلثَّمَرَٰتِ ﴾[1] دیارە ئێمە جاروباریَ بە هەندێك لە ترسو برسی بوونو لەناوچوونو کەم بونەوەی ماڵی دنیاو بەروبومتان تاقیتان دەکەینەوە. واتە: هەردەبێ خاوەن باوەڕ بە هەندێ لە ماڵو گیانو منداڵو کەسو کاری تاقی بکرێتەوە، وە خاوەن باوەڕ بەپێی بڕواکەی تاقی دەکرێتەوە، ئەگەر ئاینی بەهێزتر بوو تاقیکردنەوەکەی توندو بەهێزترە ﴿وَلَتَسْمَعُنَّ مِنَ ٱلَّذِينَ أُوتُوا۟ ٱلْكِتَـٰبَ مِن قَبْلِكُمْ وَمِنَ ٱلَّذِينَ أَشْرَكُوٓا۟ أَذًى كَثِيرًا﴾ لەوانەی ئەهلی کتێبنو ئەو کەسانەی شەریك بۆ خودا دادەنێن زۆر قسەی ناخۆش دەبیسنو ئازاری زۆریشتان ئەدەن. کاتێ کە خاوەن باوەڕەکان گەیشتنە مەدینە لە پێش جەنگی بەدرا خودای گەورە دڵخۆشیان ئەداتەوە لەسەر ئەو ئێشو ئازارەی تووشیان هات لە دەستی ئەهلی کتێبو بت پەرستەکان، فەرمانی پێدان کە دڵ فراوانو خۆڕاگرو لێبوردە بن هەتا خودا دەرویەکیان لێ دەکاتەوەو ئەفەرموێت: ﴿وَإِن تَصْبِرُوا۟ وَتَتَّقُوا۟ فَإِنَّ ذَٰلِكَ مِنْ عَزْمِ ٱلْأُمُورِ﴾ جا ئەگەر خۆڕاگر بنو لە ناڕەوا خۆ بپارێزن، کاریَ جوامێرانە دەکەن. بوخاری ڕیوایەتی کردووە لە ئوسامەی کوڕی زەیدەوە کە پێغەمبەری خودا (ﷺ) سواری گوێدرێژێ بوو پارچەیە قەیفەی فەدەکی لەسەر پشتی گوێدرێژەکە بوو. ئوسامەیش لە دوایەوە بوو، سەردانی سەعدی کوڕی عوبادەی دەکرد لە بەنی حاسی کوڕی خەزرەج، لە پێش ڕووداوی بەدرا. وتی: لەوکاتەدا تێپەڕی بەلای مەجلیسێکدا عەبدوڵلای کوڕی ئوبەیی کوڕی سەلولیان لەناودا بوو، لە پێش ئەوەدا کە عەبدوڵلای کوڕی ئوبەیی موسوڵمان ببێ، ئەو مەجلیسە بە تێکەڵاوی موسوڵمانو بت پەرستو جوولەکەی تێدا بوو. عەبدوڵلای کوڕی ئوبەیش لەوێ بوو، کاتێ کە تۆزی وڵاغەکان هات بەسەریاندا، عەبدوڵلای کوڕی ئوبەیی بە پۆشاکەکەی لوت خۆی داپۆشیو وتی: بۆچی ئەدەن بەسەرماندا، پێغەمبەری خودا (ﷺ) سڵاوی لێ کردنو پاشان وەستاو دابەزیو بانگی کردن بۆ لای خودای گەورەو قورئانی بۆ خوێندن. عەبدوڵلای کوڕی ئوبەیی وتی: ئەی پیاوەکە: بێگومان قسەیەکی چاك دەکەی ئەگەر قسەکانت هەقە. لێرەدا ئازارمان مەدە پێی. بگەڕێرەوە بۆ شوێنی خۆتو هەرکەسێ هات بۆ لات قسەی بۆ بکە، عەبدوڵلای کوڕی ڕەواحە (ڕەزای خوای لێ بێت) وتی: بەڵێ: ئەی پێغەمبەری خودا مەجلیسەکانی پێ پڕ خێر بکە. ئێمە ئەوەمان پێ خۆشە، موسوڵمانەکانو

---

[1] البقرة (١٥٥).

جولەکەو بت پەرستەکان هەڵسانەوە خەریك بوو پەلاماری یەکتری بدەن، بەردەوام پێغەمبەر (ﷺ) دای دەمرکاندنەوە هەتا بێدەنگ بوون. پاشان پێغەمبەر (ﷺ) سواری وڵاغەکەی بوو کەوتە ڕێ هەتا چووە لای سەعدی کوڕی عوبادە، پێغەمبەری خودا (ﷺ) پێی وت: (ئەی سەعد ئایا گوێت لە ئەبوحوبان نەبوو چی وت؟) مەبەستی عەبدوڵڵای کوڕی ئوبەیی بوو. ئاواو ئاوای وت. سەعد وتی: ئەی پێغەمبەری خودا (ﷺ) لێی ببورەو چاوپۆشی لێ بکە، سوێند بەو خودایە کە ئەو کتێبەی بۆ ناردویتو بەهەقیش بۆی ڕەوانە کردوی. بەڕاستی خەڵکی ئەم شارە (واتە مەدینە) خەریك بوون بیکەنە سەرۆکی خۆیان، کاتێ کە خودا نەیهێشت بەوەی بەوەی کە خودا بە تۆی بەخشی. حەسودی بەوە دەبات. ئەوە وای لێکرد کە چاوت پێی کەوت، پێغەمبەری خودا لێی بورا، پێغەمبەری خوداو (ﷺ) هاوەڵەکانی، چاوپۆشیان دەکردو دەبوران لە بت پەرستانو ئەهلی کتێب، وەك خودای گەورە فەرمانی پێدابوون، خۆڕاگر بوون بەرانبەر ئازاریان خودای گەورە ئەفەرموێت: ﴿وَلَتَسْمَعُنَّ مِنَ الَّذِينَ أُوتُوا الْكِتَابَ مِن قَبْلِكُمْ وَمِنَ الَّذِينَ أَشْرَكُوا أَذًى كَثِيرًا﴾ و لە ئایەتێکی تردا ئەفەرموێت: ﴿وَدَّ كَثِيرٌ مِّنْ أَهْلِ الْكِتَابِ لَوْ يَرُدُّونَكُم مِّن بَعْدِ إِيمَانِكُمْ كُفَّارًا حَسَدًا مِّنْ عِندِ أَنفُسِهِم مِّن بَعْدِ مَا تَبَيَّنَ لَهُمُ الْحَقُّ فَاعْفُوا وَاصْفَحُوا حَتَّىٰ يَأْتِيَ اللَّهُ بِأَمْرِهِ﴾[1] زۆر کەس لە خاوەن کتێبان (چونکە ئیرەیی پێ دەبەن) حەز دەکەن لە پاش باوەڕهێنانتان پەشیمانتان بکەنەوە، ئێوە چاویان لێ بپۆشنو لە هەڵەکانیان ببورن، تا فەرمانی خودا دەگات. پێغەمبەری خودا (ﷺ) کاری بەو لێبوردنە کرد کە خوا فەرمانی پێدابوو، هەتا خودا ئیزنی دا بۆیان. کاتێ کە غەزای بەدر دەستی پێکرد، کە خودای گەورە بەو غەزایە سەرانی خوانەناسی قورەیش پێ لەناو برد، عەبدوڵڵای کوڕی ئوبەیی کوڕی سەلولو خوانەناسو بت پەرستەکان وتیان: ئەمە کارێکە و هاتووەو چار نیە. پەیمانمان دا بە پێغەمبەرو (ﷺ) لەسەر ئیسلامەتیو موسوڵمان بوون[2] هەرەسێ هەڵسا بە گەیاندنی هەقو فەرمانی دا بە چاکەو بەرگری کرد لە خراپە دەبێ تووشی ئازار ببێ. هیچ دەرمانێکیشی نیە جگە لە خۆڕاگری لەبەر ڕەزای خوداو هانا بردن بە خوداو گەڕانەوە بۆ لای خودای گەورە.

﴿وَإِذْ أَخَذَ اللَّهُ مِيثَاقَ الَّذِينَ أُوتُوا الْكِتَابَ لَتُبَيِّنُنَّهُ لِلنَّاسِ وَلَا تَكْتُمُونَهُ فَنَبَذُوهُ وَرَاءَ ظُهُورِهِمْ وَاشْتَرَوْا بِهِ ثَمَنًا قَلِيلًا فَبِئْسَ مَا يَشْتَرُونَ ﴿١٨٧﴾ لَا تَحْسَبَنَّ الَّذِينَ يَفْرَحُونَ بِمَا أَتَوا وَّيُحِبُّونَ أَن يُحْمَدُوا بِمَا لَمْ يَفْعَلُوا

---

[1] البقرة (١٠٩).

[2] البخاري (٤٥٦٦)، مسلم (١٧٩٨).

فَلَا تَحْسَبَنَّهُم بِمَفَازَةٍ مِّنَ ٱلْعَذَابِ ۖ وَلَهُمْ عَذَابٌ أَلِيمٌ ﴿١٨٨﴾ وَلِلَّهِ مُلْكُ ٱلسَّمَٰوَٰتِ وَٱلْأَرْضِ ۗ وَٱللَّهُ عَلَىٰ كُلِّ شَىْءٍ قَدِيرٌ ﴿١٨٩﴾﴾

## زەمی ئەهلی کتێب لەسەر پەیمان شکێنی و شاردنەوەی هەق

خـودای گـەورە ئەفـەرموێت: ﴿وَإِذْ أَخَذَ ٱللَّهُ مِيثَٰقَ ٱلَّذِينَ أُوتُوا۟ ٱلْكِتَٰبَ لَتُبَيِّنُنَّهُۥ لِلنَّاسِ وَلَا تَكْتُمُونَهُۥ فَنَبَذُوهُ وَرَآءَ ظُهُورِهِمْ وَٱشْتَرَوْا۟ بِهِۦ ثَمَنًا قَلِيلًا ۖ فَبِئْسَ مَا يَشْتَرُونَ﴾ ئەوسا خـودا بـەڵێنی لـەو کەسانە وەرگرت کە کتێبیان بۆ هاتوە، بە مەردمی ڕاگەیەنن و نەیشارنەوە، کەچی ئـەوان لـە پـەیمان پاشگەز بونەوەو بە نرخێکی کەمیان فرۆشت، ئای کە سەودایە خراپیان کرد. ئەمە سەرزەنشت و هەڕەشەیەکە لەلایەن خوداوە لە ئەهلی کتێب، ئەوانەی کە خـودا پـەیمانی لـێ وەرگـرتن لەسـەر زمـانی پێغەمبـەران (سەلامی خوایان لێ بێت) کە بڕوا بە موحەممەد (ﷺ) بێنن و خەڵکی لە باس و خواسی ئاگـادار بکـەن. هەتا خۆیان ئامادە بکەن بۆ ئەو پەیامەی کە دەیهێنێ و کـاتێ کـە هـات شـوێنی کـەون، کەچـی ئـەوان ئەوەیان شاردەوەو ئەو بەڵێنەی دابویان کە خێری دنیاو قیامەتی تێدا بوو بە نرخێکی زۆر کـەمی دنیـا فرۆشتیان. بەڕاستی مامەڵەیەکی زۆر خراپ و پەیمانێکی نالەبار بوو دایان، ئەمە ئاگاداری و ترسـاندنێکە بۆ ئەو زانایانـەی ڕێگـەو ڕچـەی ئەمانـە دەگرنـە بـەر، نـەکا ئـەوەی ئەوانـە تووشـیان بـووە ئـەمانیش تووشیان بێت. کەواتە پێویستە لەسەر زانایان هەرچی توانایان هەیە بیخەنە کار بۆ زانیاری بەسوود کە نیشانەی ئاکار چاکیەو هیچی لێ نەشارنەوە لەم فەرمودەیـەدا کـە لـە زۆر ڕێگـاوە ڕیوایـەت کـراوە لـە پێغەمبـەرەوە (ﷺ) کە فەرموویەتی: (هەرکەسێ پرسیاری لێ بکـرێ لـە زانـستێ و بیـشارێتەوە، لـەغو دەکرێ لە ڕۆژی قیامەتدا بە لەغاوێ لە ئاگر) ئەم فەرموودە فەرموودەیەکی حەسەنە.[1]

## زەم کردنی ئەهلی کتێب لەسەر فێڵبازی و دڵخۆشیان بە کارێ کە نەیان کردووەو سوپاس بکرێن

خـودای گـەورە ئەفـەرموێت: ﴿لَا تَحْسَبَنَّ ٱلَّذِينَ يَفْرَحُونَ بِمَآ أَتَوا۟ وَّيُحِبُّونَ أَن يُحْمَدُوا۟ بِمَا لَمْ يَفْعَلُوا۟﴾ هەرگیز وا مەزانە ئەوانەی دڵخۆش دەکەن بە کـارێ کـە کردویانـەو پێیـان خۆشـە بـۆ کـارێ کـە نـەیان کردووە سوپاس بکرێن. واتە: بەوە ڕیبایی دەکەن و شتێ کە پێیان نەدراوە وای دەردەخەن کە زۆریـان پێدراوە، وەك لـە هـەردوو سـەحیحەکەدا هـاتووە لـە پێغەمبـەرەوە (ﷺ) کە فەرموویـەتی: (کەسـێ بانگەشە بکات بۆ شتێ ناوبانگی خۆی پێ زیـاد بکـات، خـودا جگـە لـە کـەم کردنـەوە هیـچی تـری بـۆ ناکات)[2] وە لە فەرموودەیەکی تری سەحیحا دیسان هاتووە: (کەسێ خۆی بڕازێنێتەوە بە شتێ کە پێی

---

[1] الطبراني (٨/٤٠١).

[2] البخاري (٦١٠٥/٦٦٥٢)، مسلم (١/١٠٤).

نەدرابێ وەك كەسێ دوو پۆشاكی ساختەی پۆشابێ وایە)[1] ئیمامی ئەحمەد ڕیوایەتی كردووە كە مەروان بە دەرگاوانەكەی وت: ئەی ڕافیع بچۆ بۆ لای ئیبنوعەبباس بڵێ: ئەگەر هەركەسێ لە ئێمە دڵخۆش بێ بەوەی كە هاتوە. وە پێی خۆش بێ بە كارێ كە نەیكردووە سوپاسی بكرێ ئازار بدرێ بێگومان هەموومان ئازار دەچێژین. ئیبنوعەبباس وتی: ئێوە لە كوێو ئەوە لە كوێ، بەڵكو ئەم ئایەتە لەسەر ئەهلی كتێب هاتۆتە خوارەوە. پاشان ئیبنوعەبباس ئەم ئایەتەی خوێند كە خودای گەورە ئەفـــــەرموێت: ﴿وَإِذْ أَخَذَ ٱللَّهُ مِيثَـٰقَ ٱلَّذِينَ أُوتُوا۟ ٱلْكِتَـٰبَ لَتُبَيِّنُنَّهُۥ لِلنَّاسِ وَلَا تَكْتُمُونَهُۥ فَنَبَذُوهُ وَرَآءَ ظُهُورِهِمْ وَٱشْتَرَوْا۟ بِهِۦ ثَمَنًا قَلِيلًا ۖ فَبِئْسَ مَا يَشْتَرُونَ﴾ وە ئەم ئایەتەیشی خوێند: ﴿لَا تَحْسَبَنَّ ٱلَّذِينَ يَفْرَحُونَ بِمَآ أَتَوا۟ وَّيُحِبُّونَ أَن يُحْمَدُوا۟ بِمَا لَمْ يَفْعَلُوا۟﴾ ئیبنوعەبباس وتی: پێغەمبەر (ﷺ) پرسیاری لێ كردن لە شتێك لێیان شاردەوەو بە شتێكی تر وەڵامیان دایەوە. دەرچوونو وایان پیشان دا كە بەوە وەڵامیان داوەتەوە كە پرسیاری لێ كردوون لەو بارەیەوە. بەهیوای سوپاسو ستایش كردن بوون بەوە لەو بارەیەوە دڵخۆش بوون بەو كارەی كە شاردویانەتەوە كە پرسیاری لێ كردن لە بارەیەوە[2] هەر بەم شێوەیە بوخاری لە تەفسیرەكە ڕیوایەتی كردووە، وە موسلیمو تیرمیزیو نەسائیش هەر لە تەفسیرەكەیانا ڕیوایەتیان كردووە[3] بوخاری ڕیوایەتی كردووە لە ئەبوسەعیدی خودەریەوە (ڕەزای خوای لێ بێت): كە چەند پیاوێ لە دووڕووەكان لە زەمانی پێغەمبەری خوادا (ﷺ) كاتێ پێغەمبەر (ﷺ) دەرچوایە بۆ غەزایەك، نەدەچوون بۆ ئەو غەزا لەگەڵی. كەیفیان دەكرد بە مانەوەیان كە دەرنەچوون لەگەڵ پێغەمبەر (ﷺ) كاتێ پێغەمبەر (ﷺ) دەهاتەوە لەو غەزا پۆزشیان بۆ دەهێنایەوەو سوێندیان دەخواردو حەزیان دەكرد سوپاس بكرێن لەسەر ئەو كارەی كە نەیان كردووە ئەم ئایەتە هاتە خوارەوە: ﴿لَا تَحْسَبَنَّ ٱلَّذِينَ يَفْرَحُونَ بِمَآ أَتَوا۟ وَّيُحِبُّونَ أَن يُحْمَدُوا۟ بِمَا لَمْ يَفْعَلُوا۟﴾ هەر بەم شێوە موسلیمش ئەم فەرموودەی هێناوە.[4] پاشان خودای گەورە ئەفەرموێت: ﴿فَلَا تَحْسَبَنَّهُم بِمَفَازَةٍ مِّنَ ٱلْعَذَابِ﴾ هەرگیز گومانیان پێ مەبە لە جەزرەبە ڕزگار دەبن ﴿تَحْسَبَنَّهُم﴾ بە (التاء) دەخوێنرێتەوە بۆ موخاتەبی موفرەد وە بە (یاء) هەواڵە لەبارەی ئەوانەوە. واتە: وانەزانن لە سزا ڕزگاریان بوە. بەڵكو دەبێ هەر جەزرەبە بخۆن. هەر بۆیە خودای گەورە ئەفەرموێت: ﴿وَلَهُمْ عَذَابٌ

---

[1] مسلم (٢١٢٩).

[2] أحمد (١/٢٩٨)، سەحیحە.

[3] فتح الباري (٨/٨١)، مسلم (٤/٢١٤٣)، تحفة الاحوذي (١/٦٦)، النسائي في الكبرى (٦/٣١٨).

[4] البخاري (٤٥٦٧)، مسلم (٢٧٧٧).

﴿أَلِيمٌ﴾ سزای بەژان بۆ ئەوانە. پاشان خودای گەورە ئەفەرموێت: ﴿وَلِلَّهِ مُلْكُ ٱلسَّمَٰوَٰتِ وَٱلْأَرْضِ وَٱللَّهُ عَلَىٰ كُلِّ شَىْءٍ قَدِيرٌ﴾ لە ئاسمانەکان و زەمیندا فەرمان، فەرمانی خودایە و خودا بەسەر هەموو شتێکا توانای هەیە. واتە: خودا خاوەنی هەموو شتێکە و توانای بەسەر هەموو شتێکا هەیە و هیچ شتێ نابێتە رێگری، کەواتە هەرلەخوا بترسن و سەرپێچی مەکەن و لە تورەیی و تۆڵەی خودا بترسن. چونکە ئەوەندە گەورەیە هیچ لەو گەورەتر نیە، ئەوەندەیش خاوەن توانایە هیچ کەس وەك ئەو خاوەن توانانیە.

﴿إِنَّ فِى خَلْقِ ٱلسَّمَٰوَٰتِ وَٱلْأَرْضِ وَٱخْتِلَٰفِ ٱلَّيْلِ وَٱلنَّهَارِ لَءَايَٰتٍ لِّأُو۟لِى ٱلْأَلْبَٰبِ ﴿١٩٠﴾ ٱلَّذِينَ يَذْكُرُونَ ٱللَّهَ قِيَٰمًا وَقُعُودًا وَعَلَىٰ جُنُوبِهِمْ وَيَتَفَكَّرُونَ فِى خَلْقِ ٱلسَّمَٰوَٰتِ وَٱلْأَرْضِ رَبَّنَا مَا خَلَقْتَ هَٰذَا بَٰطِلًا سُبْحَٰنَكَ فَقِنَا عَذَابَ ٱلنَّارِ ﴿١٩١﴾ رَبَّنَآ إِنَّكَ مَن تُدْخِلِ ٱلنَّارَ فَقَدْ أَخْزَيْتَهُۥ ۖ وَمَا لِلظَّٰلِمِينَ مِنْ أَنصَارٍ ﴿١٩٢﴾ رَّبَّنَآ إِنَّنَا سَمِعْنَا مُنَادِيًا يُنَادِى لِلْإِيمَٰنِ أَنْ ءَامِنُوا۟ بِرَبِّكُمْ فَـَٔامَنَّا ۚ رَبَّنَا فَٱغْفِرْ لَنَا ذُنُوبَنَا وَكَفِّرْ عَنَّا سَيِّـَٔاتِنَا وَتَوَفَّنَا مَعَ ٱلْأَبْرَارِ ﴿١٩٣﴾ رَبَّنَا وَءَاتِنَا مَا وَعَدتَّنَا عَلَىٰ رُسُلِكَ وَلَا تُخْزِنَا يَوْمَ ٱلْقِيَٰمَةِ ۗ إِنَّكَ لَا تُخْلِفُ ٱلْمِيعَادَ ﴿١٩٤﴾﴾

**نیشانەکانی یەکتاپەرستی بۆ دڵ وشیاران و رەوشتیان و قسە و پاڕانەوەیان**

خودای گەورە ئەفەرموێت: ﴿إِنَّ فِى خَلْقِ ٱلسَّمَٰوَٰتِ وَٱلْأَرْضِ﴾ لە وەدیهێنانی ئاسمانەکان و زەمیندا، واتە: لە بەرزی و فراوانی ئاسمانەکان و نزمایی و چڕی و دانانی زەویدا ئەوەی کە تێیاندایە لە نیشانەی زۆر گەورە و ئاشکرا لە ئەستێرەی گەڕۆك و وەستاو و دەریا و کێوو چۆڵەوانی درەخت و گیا و گژە و کشتوکاڵ و ڕووەك و بەروبوم و گیانەوەرو کانزاکان چەندین سوودی تری هەمەڕەنگ و بۆن و چێژو تایبەت، ﴿وَٱخْتِلَٰفِ ٱلَّيْلِ وَٱلنَّهَارِ﴾ ئالوگۆڕی شەوو ڕۆژەکان، کە بەدوای یەکا دێن و کەم و زیاد دەکەن، جارێ شەو درێژ دەبێ و جارێ ڕۆژ بە پێچەوانەشەوە. جاری وایش هەیە یەکسان دەبن. پاشان لە یەکتری دەبەن و ئەوی درێژ بوە کورت دەبێتەوە و ئەویش کورت بوە درێژ دەبێتەوە. ئەمانە هەموو بەدەست خاوەن تونای خاوەن دەستەڵاتی لەکارزانە. هەر بۆیە ئەفەرموێت: ﴿لَءَايَٰتٍ لِّأُو۟لِى ٱلْأَلْبَٰبِ﴾ زۆر نیشانەی بتەو هەیە بۆ ئەوانەی کە خاوەنی دڵ وشیارن. واتە: ئەو دڵە پاکانەی کە شتەکان بە ڕاستی و بە ڕوونی هەست پێدەکەن نەك وەك ئەوانەی کە کەڕو کوێرو بێ ئاوەزن، ئەوانەی کە خودای گەورە لە بارەیانەوە ئەفەرموێت: ﴿وَكَأَيِّن مِّنْ ءَايَةٍ فِى ٱلسَّمَٰوَٰتِ وَٱلْأَرْضِ يَمُرُّونَ عَلَيْهَا وَهُمْ عَنْهَا مُعْرِضُونَ ﴿١٠٥﴾ وَمَا يُؤْمِنُ أَكْثَرُهُم بِٱللَّهِ إِلَّا وَهُم مُّشْرِكُونَ﴾[1] چەندە نیشانە زۆرە لە ئاسمانان

---

[1] یوسف (١٠٥-١٠٦).

و زەمیندا، بەلایاندا تێدەپەڕن و گوێی پێ نادەن. بەشی زۆریان بڕوا بە خوا ناهێنن و هەر دەیانەوێ شەریکی بۆ دابنێن. پاشان خودای گەورە وەسفی دڵ وشیاران دەکات و ئەفەرموێت: ﴿ ٱلَّذِينَ يَذْكُرُونَ ٱللَّهَ قِيَـٰمًا وَقُعُودًا وَعَلَىٰ جُنُوبِهِمْ ﴾ ئەوانەی (چ بەوەستاوی و چ بە دانیشتن و چ لەسەر تەنیشت دەخەون) هەر یادی خودا دەکەن. وەك لە سەحیحی بوخاریدا هاتوە لە عیمرانی کوڕی حوسەینەوە کە پێغەمبەری خودا (ﷺ) فەرموویەتی: (بە پێوە نوێژ بکە ئەگەر نەتتوانی بە دانیشتن، گەر هەر نەتتوانی لەسەر لاتەنیشت).[1] واتە: ئەو خاوەن دڵە وشیارانە هەمیشە یادی خودا دەکەن و ناوەستن بە پەنهانی و بە دڵ و بە زمانیان ﴿ ٱلَّذِينَ يَذْكُرُونَ ٱللَّهَ قِيَـٰمًا وَقُعُودًا وَعَلَىٰ جُنُوبِهِمْ وَيَتَفَكَّرُونَ فِى خَلْقِ ٱلسَّمَـٰوَٰتِ وَٱلْأَرْضِ ﴾ لە دروستکردنی ئەم ئاسمان و زەمینە ڕادەمێنن. وە باش بیر دەکەنەوە لەو هەموو نیشانانە کە تێیاندایە کە گشت بەڵگەن لەسەر تواناو دەستەڵاتی ئەو وەدیهێنەرە مەزنە و لە زانیاری و کارزانی و بەزەیی و بڕیارەی. خودای گەورە زەمی ئەو کەسانە دەکات کە لە دروستکراوەکانی ڕانامێنن کە هەموو نیشانەن لەسەر زاتی خودا خۆیی و سیفاتەکانی و بەرنامە و تواناو دەستەڵاتی و ئەفەرموێت:

﴿وَكَأَيِّن مِّنْ ءَايَةٍ فِى ٱلسَّمَـٰوَٰتِ وَٱلْأَرْضِ يَمُرُّونَ عَلَيْهَا وَهُمْ عَنْهَا مُعْرِضُونَ ﴿١٠٥﴾ وَمَا يُؤْمِنُ أَكْثَرُهُم بِٱللَّهِ إِلَّا وَهُم مُّشْرِكُونَ ﴾[2] چەندە نیشانە زۆرە لە ئاسمانان و زەمیندا، بەلایاندا تێدەپەڕن و گوێی پێ نادەن. بەشی زۆریان بڕوا بە خوا ناهێنن و هەر دەیانەوێ شەریکی بۆ دابنێن. وە ستایشی عەبدە خاوەن باوەڕەکانی دەکات و ئەفەرموێت: ﴿ ٱلَّذِينَ يَذْكُرُونَ ٱللَّهَ قِيَـٰمًا وَقُعُودًا وَعَلَىٰ جُنُوبِهِمْ وَيَتَفَكَّرُونَ فِى خَلْقِ ٱلسَّمَـٰوَٰتِ وَٱلْأَرْضِ ﴾ ئەوانە (چ بە پێوە و چ بە دانیشتن و چ لەسەر تەنیش دەخەون) هەر یادی خودا دەکەن و لە دروست کردنی ئەم ئاسمان و زەمینانە ڕادەمێنن و دەڵێن: ﴿رَبَّنَا مَا خَلَقْتَ هَـٰذَا بَـٰطِلًا ﴾ ئەی پەروەردگارمان تۆ ئەم دەزگایەت بە فیڕۆ ساز نەداوە. بەڵکو بە هەق دروستت کردووە، تا ئەوانەی کاری خراپیان کردووە سزایان بدەی ئەوانەیش ئاکار چاکیان کردووە پاداشتیان بدەیتەوە بە چاکە. پاشان باسی پاکی و بێ عەیبی خودا دەکەن و دەڵێن: ﴿سُبْحَـٰنَكَ﴾ پاکی و بێ عەیبی هەر بۆ تۆیە. تۆ هیچ شتێکت بەبێ سوود دروست نەکردووە ﴿فَقِنَا عَذَابَ ٱلنَّارِ﴾ لە ئازاری ئاگر بمانپارێزە واتە: ئەی ئەو کەسەی خەڵکت دروست کردووە بە ڕاستی و دادپەروەری، ئەی

---

[1] فتح الباري (٢/٦٨٤).

[2] يوسف (١٠٥-١٠٦).

ئەو کەسەی دووری لە هەموو عەیبو کەمو کوڕییەك لە ئاگری جەهەنم بمانپارێزە بە ویستو کەرەمی خۆتو یارمەتیمان بدە بۆ کاریٚ خۆت لێمان ڕازی دەبی پێی. سەرکەوتومان بکە بۆ کاری چاکو ڕێنمایمان بکە بۆ بەهەشتی پڕ لە نازو نیعمەتو لە ئشازاری پڕ ژانی خۆت لامان بدە. پاشان خاوەن باوەڕان دەڵێن: ﴿رَبَّنَآ إِنَّكَ مَن تُدۡخِلِ ٱلنَّارَ فَقَدۡ أَخۡزَيۡتَهُۥ﴾ پەروەرێنمان، هەرکەسیٚ تۆ بیخەیتە ئاگر تووشی شورەبیت کردووە. ڕسوایییو شورەییەکەت بۆ ئەو خەڵکە ئاشکرا کردووە ﴿وَمَا لِلظَّٰلِمِينَ مِنۡ أَنصَارٍ﴾ ئەوانەی ستەمکارن، هیچ کەس بە هانایانەوە نایە. کەس ناتوانیٚ لە ڕۆژی قیامەتدا پەنایان بدا لە تۆ لەوەی تۆ دەتەویٚ لەگەڵیان بکەی ڕێگری بکات ﴿رَّبَّنَآ إِنَّنَا سَمِعۡنَا مُنَادِيٗا يُنَادِي لِلۡإِيمَٰنِ﴾ پەروەرێنمان ئێمە بیستمان بانگەرێك بانگەوازی دەکرد کە باوەڕ بە پەروەردگارتان بێنن، کە پێغەمبەری خودا بووە (ﷺ) ﴿أَنۡ ءَامِنُواْ بِرَبِّكُمۡ فَـَٔامَنَّاۚ﴾ فەرمووی: باوەڕ بە پەرەوەرندەتان بێنن، ئێمەش باوەڕمان هێناو شوێنی کەوتین ﴿رَبَّنَا فَٱغۡفِرۡ لَنَا ذُنُوبَنَا﴾ پەروەرێنمان لە گوناهمان خۆش ببەو دابپۆشە. ﴿وَكَفِّرۡ عَنَّا سَيِّـَٔاتِنَا﴾ هەر گوناهیٚ کردومان بیکوژێنەوە کە لە نێوان خۆتو ئێمەدایە ﴿وَتَوَفَّنَا مَعَ ٱلۡأَبۡرَارِ﴾ لەگەڵ ئەوانەی پیاوچاکن بمان مرێنە. بمانگەیەنە بە ئەوان ﴿رَبَّنَا وَءَاتِنَا مَا وَعَدتَّنَا عَلَىٰ رُسُلِكَ﴾ پەروەرێنمان ئەو شتانەش بە ئێمەت داوە کە لە زمانی پێغەمبەرانتەوە بەڵێنت پێمان داوە. وتراوە: لەسەر باوەڕ هێنان بە پێغەمبەرانت یان لەسەر زمانی پێغەمبەرانت، ئەمە دیارو ئاشکرا ترە. ﴿وَلَا تُخۡزِنَا يَوۡمَ ٱلۡقِيَٰمَةِۗ﴾ شەرمەزاری ڕۆژی قیامەتمان مەکەن. لەناو ئەو خەڵکەدا ﴿إِنَّكَ لَا تُخۡلِفُ ٱلۡمِيعَادَ﴾ تۆ لە هەر پەیمانیٚ بیدەی لاریت نیە، دەبیٚ ئەوەی کە فەرمووتە بە پێغەمبەرانت هەر بێتە دی کە ڕاوەستانە لە ڕۆژی قیامەتدا لەبەر دەستتدا. لە فەرموودەی سەحیحا هاتوە کە پێغەمبەری خودا (ﷺ) ئەم دە ئایەتەی کۆتایی سورەتی ئالی عیمرانی خوێندەوە، کاتیٚ کە هەڵدەسا بۆ شەونوێژ لە شەودا. بوخاری ڕیوایەتی کردووە لە ئیبنوعەبباسەوە (ڕەزای خوایان لیٚ بێت) وتی: شەو لەلای مەیمونەی پورم مامەوە ماوەیەك پێغەمبەر لەگەڵ خێزانەکانی قسەی کردو پاشان خەوت، کاتیٚ سیٚ یەکی دوایی شەو هات دانیشتو سەیری ئاسمانی کرد فەرمووی: ﴿إِنَّ فِي خَلۡقِ ٱلسَّمَٰوَٰتِ وَٱلۡأَرۡضِ وَٱخۡتِلَٰفِ ٱلَّيۡلِ وَٱلنَّهَارِ لَأٓيَٰتٖ لِّأُوْلِي ٱلۡأَلۡبَٰبِ﴾ پاشان هەڵساو دەستنوێژی گرتو هەڵسا بە سونەت کردنو یانزە ڕکات نوێژی کرد، پاشان بیلال بانگی داو پێغەمبەر (ﷺ) دوو ڕکات نوێژی کرد،

پاشان دەرچوو نوێژی بەیانی بە خەڵکی کرد[1] موسلیمیش هەر بەم شێوەیە ڕیوایەتی کردووە[2] ئیبنومەردەوەیهی ڕیوایەتی کردووە لە عەتاوە وتی: منو ئیبنوعومەرو عوبەیدی کوڕی عومەیر ڕۆشتین بۆ لای عائیشە (ڕەزای خوای لێ بێت) چوینە ژورەوە لە نێوان ئێمەو ئەودا پەردە بوو. وتی: ئەی عوبەید چی ڕێگرت بوو بەسەرمان بکەیتەوە؟ وتی: قسەی ئەم شاعیرە: (زُر غِباً تزدد حُباً) واتە: دوای چەند ڕۆژێ سەردانی بکە خۆشەویستیت زیاد دەکات. ئیبنوعومەر وتی: وازمان لێ بێنە، باسی سەرسوڕهێنەرترین شتمان بۆ بکە کە لە پێغەمبەری خودات (ﷺ) بینیوە. (عائیشە) گریاو وتی: هەموو کارەکانی سەرسوڕهێنەر بووە. لە شەوەکەمدا هاتە لام هەتا پێستی بەر پێستم کەوت پاشان فەرمووی: (وازم لێ بێنە پەرستنی پەروەردگاری مەزنم بکە) هەڵسا بۆ لای جەوەنەکە دەستنوێژی گرتو ئاوی زۆری بەکارنەهێنا، پاشان هەڵسا نوێژ بکات، گریا هەتا ڕیشی تەڕ بوو، پاشان سوژدەی بردو گریا هەتا زەوی تەڕ کرد، پاشان لەسەر لاتەنیشتی ڕاکشاو گریا، هەتا بیلال هاتو بانگی بەیانی بۆ دا، عائیشە وتی: (بیلال) وتی: ئەی پێغەمبەری خودا (ﷺ) چیە دەتگرێنێ، خۆ خودا لە گوناهی پێشو پاشیشت خۆش بووە؟ فەرمووی: هاوار بۆ تۆ ئەی بیلال، چی دەبێتە ڕێگرم کە نەگریم، ئەم ئایەتە لەم شەوەدا بۆم ڕەوانەکراوە: ﴿إِنَّ فِي خَلْقِ ٱلسَّمَٰوَٰتِ وَٱلْأَرْضِ وَٱخْتِلَٰفِ ٱلَّيْلِ وَٱلنَّهَارِ لَءَايَٰتٍ لِّأُو۟لِى ٱلْأَلْبَٰبِ﴾، پاشان فەرمووی: هاوار بۆ کەسێ خوێندویەتەوە تێڕامانی تیا نەکردووە[3].

﴿فَٱسْتَجَابَ لَهُمْ رَبُّهُمْ أَنِّى لَآ أُضِيعُ عَمَلَ عَٰمِلٍ مِّنكُم مِّن ذَكَرٍ أَوْ أُنثَىٰ ۖ بَعْضُكُم مِّنۢ بَعْضٍ ۖ فَٱلَّذِينَ هَاجَرُوا۟ وَأُخْرِجُوا۟ مِن دِيَٰرِهِمْ وَأُوذُوا۟ فِى سَبِيلِى وَقَٰتَلُوا۟ وَقُتِلُوا۟ لَأُكَفِّرَنَّ عَنْهُمْ سَيِّـَٔاتِهِمْ وَلَأُدْخِلَنَّهُمْ جَنَّٰتٍ تَجْرِى مِن تَحْتِهَا ٱلْأَنْهَٰرُ ثَوَابًا مِّنْ عِندِ ٱللَّهِ ۗ وَٱللَّهُ عِندَهُۥ حُسْنُ ٱلثَّوَابِ ﴿١٩٥﴾﴾

**خودا وەڵامی دڵ وشیاران ئەداتەوە**

خودای گەورە ئەفەرموێت: ﴿فَٱسْتَجَابَ لَهُمْ رَبُّهُمْ﴾ پەروەرێنیان ئاوا بە دەنگیانەوە هات. سەعیدی کوڕی مەنصور ڕیوایەتی کردووە لە سەلەمەوە کە پیاوێك بوو لە ئالی ئوممو سەلەمە ئەڵێ: ئوممو سەلەمە وتی: ئەی پێغەمبەری خودا (ﷺ) نابیسین خودا باسی ژنانی کردبێ لەم کۆچ کردنەدا بە هیچ شتێك. خودای گەورە ئەم ئایەتەی ناردە خوارەوە: ﴿فَٱسْتَجَابَ لَهُمْ رَبُّهُمْ أَنِّى لَآ أُضِيعُ عَمَلَ عَٰمِلٍ مِّنكُم مِّن ذَكَرٍ أَوْ أُنثَىٰ﴾ پەروەرێنیان ئاوا بە دەنگیانەوە هات. کە من کردەوەی هیچ مرۆڤێ لە

---

[1] فتح الباري (٨٣/٨).

[2] مسلم (٥٣٠/١).

[3] موارد الظمآن (١٣٩)، ئەم فەرموودە سەنەدەکانی زۆر لاوازەو مودەلەسە.

نێرو مێ بەبێ پاداشت نامێڵمەوە. ئەنسارەکان وتیان: ئەمە یەکەم شتێکە بەسەرماندا ڕۆشتووە [1]، حاکیم ڕیوایەتی کردووە لە موستەدرەکەکەیدا، پاشان وتی: فەرموودەیەکی سەحیحە لەسەر مەرجی بوخاری. بەڵام بوخاریو موسلیم نەیانهێناوە [2] کە خودای گەورە ئەفەرموێت: ﴿أَنِّي لَآ أُضِيعُ عَمَلَ عَٰمِلٖ مِّنكُم مِّن ذَكَرٍ أَوۡ أُنثَىٰ﴾ ئەمە تەفسیری ئەو وەڵام دانەوەیە، واتە: پێیان دەڵێتو وەڵامیان ئەداتەوە کە کرداری هیچ کەسێ لەلای بێ پاداشت نامێنێتەوە، بەڵکو بە تەواوی هەموو کەسێ پاداشتی کردەوەی خۆی وەردەگرێ چ نێر بێ یان مێ. ﴿بَعۡضُكُم مِّنۢ بَعۡضٖ﴾ هەمووتان لەلای خودا وەك یەكن لە پاداشتدا. ﴿فَٱلَّذِينَ هَاجَرُواْ﴾ ئەو کەسانە لە زێدی خۆیان دەرکراونو شوێنی بت پەرستیان بەجێ هێشتووەو هاتوون بۆ شوێنی باوەڕهێنانو کەسو کارو خۆشەویستو هاوەڵو دراوسێکانیان واز لێ هێناوە ﴿وَأُخۡرِجُواْ مِن دِيَٰرِهِمۡ﴾ لەماڵی خۆیان دەرکراون. واتە: بت پەستەکان زۆریان پێهێنان هەتا ناچاریان بکەن لە زێدی خۆیان دەریان بکەن هەر بۆیە خودای گەورە ئەفەرموێت: ﴿وَأُوذُواْ فِي سَبِيلِي﴾ لە ڕێگەی مندا ئازاریان چەشتووە. تاوانیان هەر ئەوە بووە لەلای ئەو خەڵکە کە تەنیا بڕوایان بە خودای گەورە بووە. وەك خودای گەورە لە ئایەتێکی تردا فەرموویەتی: ﴿يُخۡرِجُونَ ٱلرَّسُولَ وَإِيَّاكُمۡ أَن تُؤۡمِنُواْ بِٱللَّهِ رَبِّكُمۡ﴾ [3] ئێوەو پێغەمبەر لە زێدی خۆتان دەدەکەن لەبەر ئەوە بە خودای پەروەردگارتان باوەڕتان هەیە. وە ئەفەرموێت: ﴿وَمَا نَقَمُواْ مِنۡهُمۡ إِلَّآ أَن يُؤۡمِنُواْ بِٱللَّهِ ٱلۡعَزِيزِ ٱلۡحَمِيدِ﴾ [4] تەنیا بۆیەش لەوانە بە ڕقدا چووبوون، چونکە هەر خودای هەرە خاوەن دەستەڵاتی شایەنی سوپاس کردنیان پەرستبوو. پاشان خودای گەورە لێرەدا ئەفەرموێت: ﴿وَقَٰتَلُواْ وَقُتِلُواْ﴾ جەنگیان کردو کوژران ئەمە بەرزترین پلەیە لە پلەکان کە بجەنگن لە ڕێی خواداو بەڕێزترین شتی ببەخشێ کە گیانیەتیو ڕووی خۆی تێکەڵاوی خوێنو خۆڵ بکات لە ڕێی ئەودا، لەفەرموودەی سەحیحا هاتووە کە پیاوێ وتی: ئەی پێغەمبەری خودا (ﷺ) ئایا پێم ناڵێی ئەگەر کوژرام لە ڕێی خواداو بە خۆڕاگریو بە هیوای پاداشتی خوداو ڕووبەڕووی دوژمنو بێ هەڵاتن، ئایا خودا تاوانەکانم دەسڕێتەوە و لێم خۆش دەبێ؟ فەرمووی: (بەڵێ)، پاشان وتی: چۆنت فەرمووە؟ دوبارەی کردەوە بۆیو فەرمووی: (بەڵێ

---

[1] سعيد بن منصور (١٥٠١/٣)، حاكم بە سەحیحی داناوە لەسەر مەرجی بوخاری.

[2] الحاكم (٣٠٠/٢).

[3] الممتحنة (١).

[4] البروج (٨).

جگە لە قەرزاری ماوەیەك لەمەوپێش جوبرەئیل پێی وتم)[1]، هەر بۆیە خودای گەورە ئەفەرموێت: ﴿لَأُكَفِّرَنَّ عَنْهُمْ سَيِّـَٔاتِهِمْ وَلَأُدْخِلَنَّهُمْ جَنَّٰتٍ تَجْرِي مِن تَحْتِهَا ٱلْأَنْهَٰرُ﴾ بێ گومانە گوناهیان دەکوژێنینەوەو لە پاداشتی کردەوەیان دەیانخەمە ناو باغاتێك جۆباریان بەبەردا دەڕوات لە جۆرەها خواردنەوە لە شیرو هەنگوینو بادەو ئاوی پاكو زەلالو زۆر شتی تریش کە چاو نەی دیوەو گوێ نەی بیستوەو بە دڵی هیچ کەسێکیشا نەهاتووە لە مرۆڤ ﴿ثَوَابًا مِّنْ عِندِ ٱللَّهِ﴾ ئەمە چاکەی خودایە بۆیان خودا چاکەکەی داوەتە لای خۆی کە دەربارەیان دەیکات. چونکە پاداشتەکە گەورەیە، لەلایەن خاوەن دەستەلاتێکی مەزنو بەخشندەوەیە، پاداشتی زۆر گەورەیە ﴿وَٱللَّهُ عِندَهُۥ حُسْنُ ٱلثَّوَابِ﴾ کە پاداشتی هەرە باشیش هەر لەلای خودایە بۆ کەسێ ئاکاری چاکی کردبێ.

﴿لَا يَغُرَّنَّكَ تَقَلُّبُ ٱلَّذِينَ كَفَرُوا۟ فِى ٱلْبِلَٰدِ ﴿١٩٦﴾ مَتَٰعٌ قَلِيلٌ ثُمَّ مَأْوَىٰهُمْ جَهَنَّمُ ۚ وَبِئْسَ ٱلْمِهَادُ ﴿١٩٧﴾ لَٰكِنِ ٱلَّذِينَ ٱتَّقَوْا۟ رَبَّهُمْ لَهُمْ جَنَّٰتٌ تَجْرِى مِن تَحْتِهَا ٱلْأَنْهَٰرُ خَٰلِدِينَ فِيهَا نُزُلًا مِّنْ عِندِ ٱللَّهِ ۗ وَمَا عِندَ ٱللَّهِ خَيْرٌ لِّلْأَبْرَارِ ﴿١٩٨﴾﴾

### ترساندن لە خەڵەتان بە خەڵکی دنیاو باسی پاداشتی پیاوچاکان

خودای گەورە ئەفەرموێت: ﴿لَا يَغُرَّنَّكَ تَقَلُّبُ ٱلَّذِينَ كَفَرُوا۟ فِى ٱلْبِلَٰدِ﴾ هاتوچۆو گروفری خوانەناسان لە ولاتان، نەکا هەڵت خەڵەتێنێ. واتە: سەیری ئەو خوانەناسانە مەکە کە لە نازو نیعمەتانو زۆر دڵخۆشو کامەرانن، زۆر ناخایێنێ ئەو هەموو خۆشیو ڕابواردنیان دەڕواو نامێنێو دووچاری کرداری خراپی خۆیان دێن، کەم کەمە دەستیان بۆ شل دەکەینو ماوەیەك مۆڵەتیان ئەدەین. بەو هەموو شتانەوە کە هەیانە ﴿مَتَٰعٌ قَلِيلٌ ثُمَّ مَأْوَىٰهُمْ جَهَنَّمُ ۚ وَبِئْسَ ٱلْمِهَادُ﴾ ڕابواردنێکی کەمەو پاشان شوێنیان جەهەنەمەو جێیان گەلێك نالەبارو خراپە. ئەم ئایەتە وەك ئەو ئایەتە وایە کە خودای گەورە ئەفەرموێت: ﴿مَا يُجَٰدِلُ فِىٓ ءَايَٰتِ ٱللَّهِ إِلَّا ٱلَّذِينَ كَفَرُوا۟ فَلَا يَغْرُرْكَ تَقَلُّبُهُمْ فِى ٱلْبِلَٰدِ﴾[2] جگە لە خوانەناسەکان، هیچ کەسێ لەسەر نیشانەکانی خودا کێشە ناکات. هاتوچۆیان بە شاراندا، نەکا تۆ هەڵخەڵەتێنێ. وە ئەفەرموێت: ﴿قُلْ إِنَّ ٱلَّذِينَ يَفْتَرُونَ عَلَى ٱللَّهِ ٱلْكَذِبَ لَا يُفْلِحُونَ ﴿٦٩﴾ مَتَٰعٌ فِى ٱلدُّنْيَا ثُمَّ إِلَيْنَا مَرْجِعُهُمْ ثُمَّ نُذِيقُهُمُ ٱلْعَذَابَ ٱلشَّدِيدَ بِمَا كَانُوا۟ يَكْفُرُونَ﴾[3] بڵێ: ئەوانەی

---

[1] مسلم (٣/١٥٠١).

[2] غافر (٤).

[3] یونس (٦٩-٧٠).

درۆ بۆ خوا هەڵدەبەستن ڕزگار نابن، ڕابواردنێکی کەمە لە دنیادا، لە دوایدا دەگەڕێنەوە بۆ لامان لە پاش ئەوە، لە سزای حاشا کردنیان بە توندی ئازاریان ئەدەین. وە ئەفەرموێت: ﴿ نُمَتِّعُهُمْ قَلِيلًا ثُمَّ نَضْطَرُّهُمْ إِلَىٰ عَذَابٍ غَلِيظٍ ﴾[1] وادەکەین کەمێ ڕابوێرن، پاشان ناچار بەرەو ئازاری دژواریان ڕادەکێشین. وە ئەفەرموێت: ﴿فَمَهِّلِ ٱلْكَٰفِرِينَ أَمْهِلْهُمْ رُوَيْدًۢا﴾[2] سا تۆ ماوەی ئەم خوانەناسانە بدە. کەمێکیان لێ ڕاوەستە، وە خودای گەورە لە ئایەتێکی تریشدا ئەفەرموێت: ﴿ أَفَمَن وَعَدْنَٰهُ وَعْدًا حَسَنًا فَهُوَ لَٰقِيهِ كَمَن مَّتَّعْنَٰهُ مَتَٰعَ ٱلْحَيَوٰةِ ٱلدُّنْيَا ثُمَّ هُوَ يَوْمَ ٱلْقِيَٰمَةِ مِنَ ٱلْمُحْضَرِينَ ﴾[3] ئاخۆکەسێ بەڵێنی باشمان پێداوەو بۆشی پێك دێ، لەگەڵ کەسێ هەر لە دنیا ژیاندومانە، وەك یەکن؟ کە ئەمەشیان لە ڕۆژی قیامەت دەهێنین بۆ وەڵام دانەوە؟ هەر بەو شێوەیە کاتێ باسی ژیانی خوانەناسان دەکات لە دنیادا، باسی پاشەڕۆژیشیان دەکات لەناو ئاگرا. پاشان خودای گەورە لێرەدا ئەفەرموێت: ﴿ لَٰكِنِ ٱلَّذِينَ ٱتَّقَوْا۟ رَبَّهُمْ لَهُمْ جَنَّٰتٌ تَجْرِى مِن تَحْتِهَا ٱلْأَنْهَٰرُ خَٰلِدِينَ فِيهَا نُزُلًا مِّنْ عِندِ ٱللَّهِ ۗ وَمَا عِندَ ٱللَّهِ خَيْرٌ لِّلْأَبْرَارِ ﴾ بەڵام ئەوانەی وا ترسیان لە پەروەردگاری خۆیانە، باغاتێکیان هەیە جۆباریان بەبەردا دەڕوا تا سەر تیا دەبن و میوانداری لای خودایە، ئەوەی کە لە خواوە ئەدرێ هەر بۆ پیاوچاکان ڕەوایە. ئیبنوجەریر ڕیوایەتی کردووە لە ئەبودەردائەوە کە وتویەتی: هیچ خاوەن باوەڕێ نیە مەگین مردن چاکترە بۆی، وە هیچ خوانەناسێکیش نیە مەگین مردن چاکترە بۆی. هەرکەسێ بڕوام پێ ناکات، بێگومان خودای گەورە ئەفەرموێت: ﴿وَمَا عِندَ ٱللَّهِ خَيْرٌ لِّلْأَبْرَارِ ﴾ وە ئەفەرموێت: ﴿وَلَا يَحْسَبَنَّ ٱلَّذِينَ كَفَرُوٓا۟ أَنَّمَا نُمْلِى لَهُمْ خَيْرٌ لِّأَنفُسِهِمْ ۚ إِنَّمَا نُمْلِى لَهُمْ لِيَزْدَادُوٓا۟ إِثْمًا ۚ وَلَهُمْ عَذَابٌ مُّهِينٌ ﴾[4] با ئەوانەی خوانەناسن وا نەزانن ئەو مۆڵەتەی ئەیاندەینێ، چاکە بۆیان. هەر بۆیە مۆڵەتیان ئەدەین تا تاوانیان زۆر بێ، ئازارێکی ئابڕوبەریش بەشیان دەبێ[5].

---

[1] لقمان (٢٤).

[2] الطارق (١٧).

[3] القصص (٦١).

[4] ال عمران (١٧٨).

[5] الطبري (٧/٤٩٦).

﴿وَإِنَّ مِنْ أَهْلِ الْكِتَابِ لَمَن يُؤْمِنُ بِاللَّهِ وَمَا أُنزِلَ إِلَيْكُمْ وَمَا أُنزِلَ إِلَيْهِمْ خَاشِعِينَ لِلَّهِ لَا يَشْتَرُونَ بِآيَاتِ اللَّهِ ثَمَنًا قَلِيلًا ۗ أُولَٰئِكَ لَهُمْ أَجْرُهُمْ عِندَ رَبِّهِمْ ۗ إِنَّ اللَّهَ سَرِيعُ الْحِسَابِ ﴿١٩٩﴾ يَا أَيُّهَا الَّذِينَ آمَنُوا اصْبِرُوا وَصَابِرُوا وَرَابِطُوا وَاتَّقُوا اللَّهَ لَعَلَّكُمْ تُفْلِحُونَ ﴿٢٠٠﴾﴾

### ژیانی هەندێ لە ئەهلی کیتاب و پاداشتیان

خودای گەورە ئەفەرموێت: ﴿وَإِنَّ مِنْ أَهْلِ الْكِتَابِ لَمَن يُؤْمِنُ بِاللَّهِ وَمَا أُنزِلَ إِلَيْكُمْ وَمَا أُنزِلَ إِلَيْهِمْ خَاشِعِينَ لِلَّهِ﴾ لەناو ئەهلی کتێبیش کەسانی وا هەن کە بڕوای بە خوا هەیەو بەو قورئانەی کە بۆ ئێوە هاتۆتە خوارو بەو کتێبەی کە بۆ خۆیان ڕەوانە کراوە، خاکەسارن بەرانبەر خودا. خودای گەورە باسی دەستەیەك لە ئەهلی کتێب دەکات کە بەڕاستی بڕوایان بە خودا هەیەو بەو قورئانەش کە بۆ موحەممەد ڕەوانە کراوەو بەو کتێبانەش کە لە پێشەوە هاتوون. و گوێڕایەڵی خوداو ملکەچی فەرمانی ئەونو خاکەسارن لە خزمەتیا ﴿لَا يَشْتَرُونَ بِآيَاتِ اللَّهِ ثَمَنًا قَلِيلًا﴾ بەڵگەو نیشانەکانی خودا بە نرخی کەم نافرۆشن. واتە: ئەم مژدانەی لەبارەی موحەممەدەوە هاتوونو ئاگادار کراون لێی نایشارنەوە. باسی سیفەتەکانیو سیفەتی ئوممەتەکەیو شوێنی ڕەوانە کردنی. ئا ئەوانە چاکترینی ئەهلی کتێبنو هەڵبژاردەو پاکترینیانن. ئیتر ئەوانە مەسیحی بن یان جوولەکە. خودای گەورە لە سورەتی قەسەسدا فەرموویەتی: ﴿الَّذِينَ آتَيْنَاهُمُ الْكِتَابَ مِن قَبْلِهِ هُم بِهِ يُؤْمِنُونَ ﴿٥٢﴾ وَإِذَا يُتْلَىٰ عَلَيْهِمْ قَالُوا آمَنَّا بِهِ إِنَّهُ الْحَقُّ مِن رَّبِّنَا إِنَّا كُنَّا مِن قَبْلِهِ مُسْلِمِينَ ﴿٥٣﴾ أُولَٰئِكَ يُؤْتَوْنَ أَجْرَهُم مَّرَّتَيْنِ بِمَا صَبَرُوا﴾[1] ئەو کەسانەی بەر لە هاتنی قورئان ئێمە کتێبمان پێداون، باوەڕیان بە قورئان هەیە، کاتێ بۆیان دەخوێننەوە، دەڵێن: بڕوامان پێ هێناو بێگومان ڕاستەو لەلای پەروەرێنمانەوەیە، بەر لەوەش بێتە خوارەوە ئێمە قبوڵمان کردووە، ئەوانە چوون خۆڕاگر بوون، دووجار پاداشتیان پێ ئەدرێت: وە خودای گەورە ئەفەرموێت: ﴿الَّذِينَ آتَيْنَاهُمُ الْكِتَابَ يَتْلُونَهُ حَقَّ تِلَاوَتِهِ أُولَٰئِكَ يُؤْمِنُونَ بِهِ﴾[2] ئەو کەسانەی کە کتێبمان پێیان داوە، وەك پێویستە دەیخوێننەوە، دیارە بڕوایان پێی هەیە. وە ئەفەرموێت: ﴿وَمِن قَوْمِ مُوسَىٰ أُمَّةٌ يَهْدُونَ بِالْحَقِّ وَبِهِ يَعْدِلُونَ﴾[3] دەستەیەکیش لە هۆزی موسادا هەیە، بەڕاستی ڕێ دەگرنە بەرو بە ڕاستیش دادوەری دەکەن، وە ئەفەرموێت: ﴿لَيْسُوا سَوَاءً ۗ مِّنْ أَهْلِ الْكِتَابِ أُمَّةٌ قَائِمَةٌ

---

[1] القصص (٥٢-٥٤).

[2] البقرة (١٢١).

[3] الاعراف (١٥٩).

يَتْلُونَ ءَايَٰتِ ٱللَّهِ ءَانَآءَ ٱلَّيْلِ وَهُمْ يَسْجُدُونَ ﴾[1] ئەهلی کتێب هەموو وەك یەك نین، کۆمەڵی وایان تێدیە کە ڕوو بە خوا دەوەستن‌و بە شەوا ئایەتەکانی خودا دەخوێننەوەو سەر دەخەنە سەر سوژدەوە. وە ئەفـــەرموێت: ﴿قُلْ ءَامِنُوا۟ بِهِۦٓ أَوْ لَا تُؤْمِنُوٓا۟ ۚ إِنَّ ٱلَّذِينَ أُوتُوا۟ ٱلْعِلْمَ مِن قَبْلِهِۦٓ إِذَا يُتْلَىٰ عَلَيْهِمْ يَخِرُّونَ لِلْأَذْقَانِ سُجَّدًا ﴿١٠٧﴾ وَيَقُولُونَ سُبْحَٰنَ رَبِّنَآ إِن كَانَ وَعْدُ رَبِّنَا لَمَفْعُولًا ﴿١٠٨﴾ وَيَخِرُّونَ لِلْأَذْقَانِ يَبْكُونَ وَيَزِيدُهُمْ خُشُوعًا﴾[2] بڵـێ: ئێوە بڕواتان پێ بێ یا نەبێ، ئەو کەسانەی لە پێشودا (لەمە) ئاگادار کرابوون، هەرکاتێ بۆیان دەخوێننەوە چەناکە دەخەنە سەر زەوی‌و سوژدە دەبەن. ئەشڵێن: پاکی بۆ پەروەردگاری ئێمەیە، بەڵێنی پەروەرێنمان وا وەدی هات. دەمەوڕوو خۆیان بەسەر زەویدا دەخەن‌و دەگرین‌و ئەمەش خۆ بە کەم زانینیان زیاتر دەکات. ئەم سیفەتە لەناو جوولەکەکاندا هەیە، بەلام کەمە، وەك دەبینرێ لە عەبدوڵڵای کوڕی سەلام‌و هاو وێنەی لەو زانایانەی جوولەکە، کە نەگەیشتۆتە دە کەس. بەلام مەسیحیەکان زۆریان ڕێی ڕاستیان گرتە بەرو ملکەچی هەق بوون وەك خودای گەورە ئەفەرموێت: ﴿لَتَجِدَنَّ أَشَدَّ ٱلنَّاسِ عَدَٰوَةً لِّلَّذِينَ ءَامَنُوا۟ ٱلْيَهُودَ وَٱلَّذِينَ أَشْرَكُوا۟ ۖ وَلَتَجِدَنَّ أَقْرَبَهُم مَّوَدَّةً لِّلَّذِينَ ءَامَنُوا۟ ٱلَّذِينَ قَالُوٓا۟ إِنَّا نَصَٰرَىٰ﴾[3] بێگومانە جوولەکەکان‌و شەریك دانەران بۆ خودا، لە دوژمنی لەگەڵ خاوەن باوەڕەکاندا سەرسەخت ترن. ئەو کەسانەش کە وتیان: ئێمە مەسیحین زیاتر بڕوادارەکانیان خۆش دەوێ. هەتا دەکاتە ﴿فَأَثَٰبَهُمُ ٱللَّهُ بِمَا قَالُوا۟ جَنَّٰتٍ تَجْرِى مِن تَحْتِهَا ٱلْأَنْهَٰرُ خَٰلِدِينَ فِيهَا﴾[4] لەبەرانبەر ئەو قسانەدا ئەوان وتیان: خودا دەیانباتە باغاتێك جۆباریان بەبەردا دەڕواو تا سەر هەر تیا دەبن. هەر بۆیە لێرەدا خودای گەورە ئەفەرموێت: ﴿أُو۟لَٰٓئِكَ لَهُمْ أَجْرُهُمْ عِندَ رَبِّهِمْ﴾ ئەوانە پەروەردگاریان پاداشتی کاریان دەداتەوە. وە لە فەرموودەی سەحیحا هاتووە کە جەعفەری کوڕی تالیب (ڕەزای خوای لێ بێت) کاتێ کە سورەتی (مریم)ی خوێندەوە لەلای نەجاشی پاشای حەبەشە، کە زاناو قەشەکانی لەلا بوو، گریاو ئەوانیش لەگەڵی گریان هەتا ڕیشیان تەڕ بوو[5] وە لە هەردوو سەحیحەکەدا هاتوە کاتێ نەجاشی مرد، پێغەمبەر (ﷺ) باسی مردنی نەجاشی بۆ هاوەڵەکانی کردو فەرمووی: (برایەکتان لە حەبەشە مرد نوێژی لەسەر بکەن)، چووە دەرەوە بۆ

---

[1] آل عمران (١١٣).

[2] الاسراء (١٠٧-١٠٩).

[3] المائدة (٨٢).

[4] المائدة (٨٥).

[5] إبن هشام (١/٣٥٧).

شوێنێکی سارا ڕیزی کردن و نوێژی لەسەر کرد[1]. ئیبنوئەبی نەجیح وتی: لە موجاهیدەوە: ﴿ وَإِنَّ مِنْ أَهْلِ ٱلْكِتَـٰبِ ﴾ لەناو ئەهلی کتێبدا کەسانی وا هەن. واتە: موسوڵمانی ئەهلی کتێب[2] عەببادی کوڕی مەنسور وتی: پرسیارم کرد لە حەسەنی بەسری لەم ئایەتەدا کە خودای گەورە ئەفەرموێت: ﴿ وَإِنَّ مِنْ أَهْلِ ٱلْكِتَـٰبِ لَمَن يُؤْمِنُ بِٱللَّهِ ﴾ وتی: ئەوانە ئەو ئەهلی کتێبانەن کە موحەممەدیان (ﷺ) قەبوڵ کردبوو، شوێنیشی کەوتبوون و ئیسلامیشیان ناسیبوو. خودای گەورە دووجار پاداشتی داونەتەوە: بەوە ئەوانەی کە پێش هاتنی موحەممەد (ﷺ) بڕوایان پێ هێنابوو، بەوەیش کە شوێنی موحەممەد (ﷺ) کەوتن. ئیبنوئەبی حاتەم ڕیوایەتی کردووە. وە لە هەردوو سەحیحەکەدا هاتوە لە ئەبوموساوە، وتی: پێغەمبەری خودا (ﷺ) فەرموویەتی: (سێ کۆمەڵ پاداشتی خۆیان دووجار پێ ئەدرێت)[3]، لەوانەی کە باسیکردن: (وە پیاوێکە لە ئەهلی کتێب بڕوای بە پێغەمبەرەکەی خۆی هێناوە و بڕواشی بە من هێناوە).

وە خودای گەورە ئەفەرموێت: ﴿لَا يَشْتَرُونَ بِـَٔايَـٰتِ ٱللَّهِ ثَمَنًا قَلِيلًا ﴾ وە نیشانەکانی خودا بە نرخێکی کەم سەودا ناکەن. واتە: ئەو زانیاریانەی لەبەردەستیاندایە نایشارنەوە، وەك دەستەیەکی خراپیان پێی هەڵساو بە بەلاش بەخشیان. هەر بۆیە خودای گەورە ئەفەرموێت: ﴿أُوْلَـٰٓئِكَ لَهُمْ أَجْرُهُمْ عِندَ رَبِّهِمْ ۗ إِنَّ ٱللَّهَ سَرِيعُ ٱلْحِسَابِ ﴾ ئەوانە پەروەردگاریان پاداشتی کاریان ئەداتێ. خودا زۆر زوو بە کاری هەرکەس ڕادەگات و هەژماری دەکات بۆیان. موجاهید وتی: ﴿سَرِيعُ ٱلْحِسَابِ ﴾ واتە: زۆر زوو هەژماری دەکات، ئیبنوئەبی حاتەم و کەسانی تریش ڕیوایەتیان کردووە.

### فەرماندان بە خۆڕاگری و بۆ پێشەوە چوون لە خۆڕاگریدا

خودای گەورە ئەفەرموێت: ﴿ يَـٰٓأَيُّهَا ٱلَّذِينَ ءَامَنُوا۟ ٱصْبِرُوا۟ وَصَابِرُوا۟ وَرَابِطُوا۟ ﴾ ئەی کۆمەڵی خاوەن باوەڕان، خۆڕاگر بن، لە خۆڕاگریشدا هەر لە پێشەوە بن، بۆ پاراستنی سنورەکان هەمیشە ئامادە و تەیار بن. حەسەنی بەسری (ڕەحمەتی خوای لێ بێت) وتی: فەرمان کراوە بە خاوەن باوەڕان کە خۆڕاگر بن لەسەر ئاینەکەیان، ئەو ئاینەی کە خودا بۆی ناردوون کە ئیسلامە هەرگیز دەست بەرداری نەبن لە خۆشی و ناخۆشی و تەنگانە و فەرحانەدا، هەتا بە موسوڵمانی دەمرن. بەردەوام

---

[1] فتح الباري (٧/٢٣٠)، مسلم (٢/٦٥٧).

[2] الطبري (٧/٤٩٩).

[3] فتح الباري (٦/١٦٩)، مسلم (١/١٣٤).

خۆڕاگر بن بەرانبەر ئەو دوژمنانەی کە ئاینەکەیان دەشارنەوە.[1] هەر بەم شێوەیە چەندین لە زانایانی پێشینە وتویانە. بەڵام لەبارەی (المرابطة)وە، بریتیە لە بەردەوام بوون لە شوێنی خواپەرستیاو کۆڵ نەدان بە دڵسۆزی. ئیبنوعەبباس و سەهلی کوڕی حونەیف و موحەممەدی کوڕی قەرەزیو کەسانی تریش دەڵێن: چاوەڕوانی نوێژ دوای نوێژ. ئیبنوئەبی حاتەم لێرەدا ئەم فەرموودەی ڕیوایەت کردووە کە موسلیمو نەسائی ڕیوایەتیان کردووە لە ئەبوهورەیرەوە (ڕەزای خوای لێ بێت) لە پێغەمبەرەوە (ﷺ) کە فەرموویەتی: (ئایا پێتان ڕاگەیەنم بەوەی کە خودا تاوانی پێ دەسڕێتەوەو پلەکانی پێ بەرز دەکاتەوە؟ گرتنی دەستنوێژ سەرەڕای نارەحەتیو زۆر هەنگاونان بۆ مزگەوتەکانو چاوەڕوانی نوێژ پاش نوێژێکی تر، ئەوە ئێشك گرتنی ئێوەیە، ئەوە ئێشك گرتنی ئێوەیە، ئەوە ئێشك گرتنی ئێوەیە)[2].

وە وتراوە مەبەست بە (المرابطة) لێرەدا خۆ ئامادەکردن بۆ غەزاو شەڕ کردن لەگەڵ دوژمنو پاراستنی سنوورەکانی ئیسلامو ڕێگری لە نزیك چوونەی دوژمن لە وڵاتی موسوڵمانانە زۆر فەرموودە هاتوە لەو بارەیەوەو باسی پاداشتی ئەو کەسانە کراوە کە سنوری ئیسلام دەپارێزنو هەمیشە ئامادەو خۆبەخت کەرن. بوخاری ڕیوایەتی کردووە لە سەحیحەکەیدا لە سەهلی کوڕی ساعیدیەوە کە پێغەمبەری خودا (ﷺ) فەرموویەتی: (خۆ سازدان بۆ پاراستنی سنوری ئیسلام شەوو ڕۆژێ چاکترە لە دنیاو لەوەیش کە تیایەتی)[3] موسلیم ڕیوایەتی کردووە لە سەلمانی فارسیەوە لە پێغەمبەری خوداوە (ﷺ) کە فەرموویەتی: (سەنگەرگیری شەوو ڕۆژێك لە ڕێگەی خوادا چاکترە لە ڕۆژوی سونەتی مانگێكو شەونوێژی شەوەکانی ئەگەر لەو ماوەیەشدا بمرێت کردەوە چاکەکانی دنیای هەر بە بەردەوامی بۆ دەمێنێتەوەو ڕزقو ڕۆزیەکەی بەردەوام دەبێو لە سزای گۆڕیش دڵنیا دەبێت)[4] ئیمامی ئەحمەد ڕیوایەتی کردووە لە فوزالەی کوڕی عوبەیدەوە، وتی: بیستم لە پێغەمبەری خوداوە (ﷺ) ئەیفەرموو: (هەموو مردویەك لەسەر کردەوەی کۆتایی ژیانی زیندوو دەکرێتەوە جگە لەو کەسەی سەنگەر گیری کردووە لە ڕێی خوادا، بێگومان ئەو کەسە کردەوەکانی بۆ زیاد دەکرێ هەتا ڕۆژی قیامەت، دڵنیاش دەبێ لە سزای گۆڕ)[5] هەر بەم شێوەیە ئەبوداوودو تیرمیزی ڕیوایەتیان کردووە. تیرمیزی وتی: فەرموودەیەکی حەسەنی سەحیحە.[6] ئیبنوحبانیش لە سەحیحەکەیدا هێناویەتی[1]

---

[1] الطبري (٧/٥٠٢).

[2] مسلم (١/٢١٩)، النسائي (١/٨٩).

[3] البخاري (٢٨٩٦).

[4] مسلم (١٩١٣).

[5] أحمد (٦/٢٠)، فەرموودەیەکی حەسەنە.

[6] أبوداود (٣/٢٠)، تحفة الاحوذي (٩/٢٤٥)، حەسەنە.

تیرمیزی ڕیوایەتی کردووە لە ئیبنوعەبباسەوە وتی: بیستوم لە پێغەمبەری خوداوە (ﷺ) فەرموویەتی: (دوو چاو هەن ئاگریان بەر ناکەوێ، چاوێ لە ترسی خودا گریا بێت، وە چاوێ بە شەو مابێتەوە لە ڕێی خوادا پاسەوانی بکات)[2] بوخاری لە سەحیحەکەیدا ڕیوایەتی کردووە لە ئەبوهورەیرەوە (ڕەزای خوای لێ بێت) وتی: پێغەمبەری خودا (ﷺ) فەرموویەتی: (کوێرەوەرو کەساسە عەبدی دینارو عەبدی درهەم و عەبدی سك برسی، ئەگەر پێی درا ڕازی بووە ئەگەر پێی نەدرا تورەو وەڕەسە، کوێرەوەرو شکاوەیە بەسەر خۆیدا، ئەگەر درکێکی پێداچوو کەس بۆی دەرنەهێنێ، خۆشبەختی بۆ عەبدێ جڵەوی وڵاغەکەی بە دەستەوەیە لە ڕێی خوادا، قژی سەری گرژ بوەو هەردوو پێی تۆزاویەو، ئەگەر لە پاسەوانیدا بێ لە پاسەوانیدایەو، ئەگەر لە ڕۆشتنا بێ وا لە ڕۆشتنا، ئەگەر داوای ئیزن بکات، ئیزن نادرێ، ئەگەر تکایش بکات تکاکەی وەرناگیرێ)[3] چونکە کەسێکی دیار نی یە. وە ئیبنوجەریر ڕیوایەتی کردووە لە زەیدی کوڕی ئەسلەمەوە وتی: ئەبوعوبەیدە نووسی بۆ عومەری کوڕی خەتاب باسی کۆمەڵی ڕۆمەکانی بۆ کرد، ئەو ترسەی هەیانە لە بارەیانەوە. عومەر بۆی نوسیەوە وتی: أما بعد، بێگومان هەرچەندە عەبدی خاوەن باوەڕ بکەوێتە شوێنی ترس و زۆر نارەحەتیەوە خودای گەورە دوای ئەوە دەروی لێ دەکاتەوە، دوو ناخۆشی سەرناکەوێ بەسەر خۆشیەکا. خودای گەورە لە کتێبەکەیدا ئەفەرموێت: ﴿يَٰٓأَيُّهَا ٱلَّذِينَ ءَامَنُوا۟ ٱصْبِرُوا۟ وَصَابِرُوا۟ وَرَابِطُوا۟ وَٱتَّقُوا۟ ٱللَّهَ لَعَلَّكُمْ تُفْلِحُونَ﴾[4] حافیز (الحافظ) ئیبنوعەساکیر ڕیوایەتی کردووە لە ژیاننامەی عەبدوڵلای کوڕی موبارەکا لە ڕێگەی موحەممەدی کوڕی ئیبراهیمی کوڕی سەکینەوە وتی: عەبدوڵلای کوڕی موبارەك ئەو چەند دێرە شیعرەی بۆ خوێندمەوە لە تەرسوس کە خواحافیزیم لێ کرد بۆ دەرچوون لەگەڵما خوێندیەوەبۆ فوزەیلی کوڕی عەیاز لە ساڵی سەدو حەفتادا، لە ڕیوایەتێکی تردا هاتوە لە ساڵی سەدو حەفتاو حەوتا.

| | |
|---|---|
| يا عابدَ الحرمين لو أبصرتنا | لعلمت أنك في العبادة تلعب |
| من كان يخضب خدَّه بدموعه | فنحورنا بدمائنا تتخضب |
| أو كان يُتعب خيله في الباطلِ | فخيولنا يوم الصبيحة تتعُب |
| ريح العبير لكم و نحن عبيرنا | وهيج السنابك و الغبار الاطيبُ |

[1] إبن حبان (٦٩/٧)، حەسەنە.

[2] التيرميزي (١٦٣٩)، فەرموودەیەکی حەسەنە.

[3] البخاري (٢٨٨٦).

[4] الطبري (٥٠٣/٧).

و لقد أتانا من مقال نبيِّنا قول صحيح صادق لا يكذبُ

لايستوي و غبار خيل الله في أنف أمرئٍ و دخانَ نار تلهب

هذا كتابَ الله ينطق بيننا ليس الشهيد بميت لا يكذب

عەبدوڵڵای کوڕی موبارەك لەم چەند دێرە شیعرەدا دەڵێ بە فوزەیلی کوڕی عەیاز، ئەی ئەو کەسەی کە خەریکی خواپەرستیت لە مەککەو مەدینەدا، ئەگەر ئێمەت بدیایە دەتزانی کە تۆ یاری بە عیبادەت دەکەی، ئەوەی کە کوڵمی خۆی بە فرمێسکی تەڕ دەکات. ئێمە گەردنمان بە خوێن تەڕ دەبێ، یان وڵاغەکەی لە پرپوچا ماندوو دەکات، وڵاغەکانی ئێمە لە بەرەبەیاندا ماندوو دەبێ. بۆنی عەبیر بۆئێوە، عەبیری ئێمە پرشەی ژێر قاچی وڵاغەکانمان‌و تۆزی پاك‌و خاوێنە. وە لە فەرموودەی پێغەمبەرمانەوە پێمان گەیشتووە کە فەرموودەیەکی ڕاست‌و دروستەو درۆی تیا نیە تۆزی سمی ئەو وڵاغانەو دووکەڵی ئاگرێ کە بڵێسەی دێ لەلای کەس وەك یەك نیە ئەمە کتێبی خودایە لە نێوانماندا ئەفەرموێت، شەهیدو مردو وەك یەك نیەو ڕاست ئەفەرموێ. وتی: گەیشتم بە فوزەیلی کوڕی عەیاز لە کەعبەی پیرۆزا بە نامەکەوە، کاتێ کە نامەکەی خوێندەوە چاوەکانی پڕ بوو لە فرمێسك‌و، وتی: تۆ ئەم نامەت نوسیوە؟ وتم: بەڵێ، وتی: ئەو نامەیە لە باتی کرێی ئەو نامەیەدا کە لە ئەبوعەبدوڕەحمانەوە بۆت هێناوین بنووسە. وتی: فوزەیلی کوڕی عەیاز پێی دەوتم‌و منیش ئەمنوسی. مەنسوری کوڕی موعتەمەر بۆی گێڕاینەوە لە ئەبوسالمەوە لە ئەبوهورەیرەوە کە پیاوێك وتی: ئەی پێغەمبەری خودا (ﷺ)، فێری کارێکم بکە کە پاداشتی موجاهیدی ڕێی خودای لەسەر وەربگرم، فەرمووی: ئایا دەتوانی نوێژ بکەی‌و وچان نەدەی ڕۆژو بگری‌و نەیشکێنی؟ وتی: ئەی پێغەمبەری خودا من زۆر لاوازترم لەوە کە بتوانم ئەوە بکەم، پاشان پێغەمبەر(ﷺ) فەرمووی: (سوێند بەو کەسەی گیانی منی بەدەستە، ئەگەر ئەوەیش بتوانی ناگەیتە موجاهیدینی ڕێی خودا. ئایا زانیوتە وڵاغی موجاهیدین کە دەڕوات بە ڕێدا، بەوە چاکە بۆ خاوەنەکەی دەنوسرێ). پاشان خودای گەورە ئەفەرموێت: ﴿وَٱتَّقُوا۟ ٱللَّهَ﴾ لە خودا بترسن لە هەموو ئیش‌و کارێکتاندا وەك پێغەمبەری خودا (ﷺ) فەرمووی بە مەعاز کاتێ کە ناردی بۆ یەمەن: (لە هەر شوێنێکا بوی لە خودا بترسە بە دوای خراپەدا چاکەبنێرە دەیسڕێتەوە، بە ڕەوشتی چاك لەگەڵ خەڵکیا بجولێرەوە)[1]، ﴿لَعَلَّكُمْ تُفْلِحُونَ﴾ بەڵکو ڕزگار ببن لە دنیاو لە ڕۆژی دوایدا. ئیبنوجەریر ڕیوایەتی کردووە لە موحەممەدی کوڕی کەعبی

[1] تحفة الاحوذي (١٢٣/٦)، حەسەنە.

قورەزیەوە کە لەم ئایەتەدا: ﴿وَاتَّقُوا اللَّهَ لَعَلَّكُمْ تُفْلِحُونَ﴾ دەیوت: لە خودا بترسن لە نێوان خۆتان و مندا بەڵکو کە بەیانی کە پێم دەگەن ڕزگار ببن.[1]

تەفسیری سورەتی ئالی عیمران تەواو بوو سوپاس و ستایش بۆ خودای گەورە هیوامان وایە کە لەسەر ڕێبازی قورئان و سونەت بمرین ئامین.

## تەفسیری سورەتی (النساء)

## لە مەدینە هاتووەتە خوارەوە

### هەندێ لە ڕێزەکانی ئەم سورەتە

عەوفی وتی لە ئیبنو عەباسەوە: سوورەتی نیساء لە مەدینە هاتۆتە خوارەوە، هەر بەم شێوەیە ئیبنومەردویەی ڕیوایەتی کردووە لە عەبدوڵلای کوڕی زوبەیرو زەیدی کوڕی سابیتەوە، حاکیم لە موستەدرەکەکەیدا ڕیوایەتی کردووە لە عەبدوڵلای کوڕی مەسعودەوە (ڕەزای خوای لێ بێت) وتی: لە سورەتی نیسائدا پێنج ئایەت هەن ئەوەی لە دنیاو ئەویش تیایتی بم بێ ئەوەندە دڵخۆشم ناکات ﴿إِنَّ اللَّهَ لَا يَظْلِمُ مِثْقَالَ ذَرَّةٍ﴾[2] خودا بە سەنگی مێرولەی زەردی وردیلەش ناهەقی لە هیچ کەس ناکات. وە ﴿إِن تَجْتَنِبُوا كَبَائِرَ مَا تُنْهَوْنَ عَنْهُ﴾[3] ئەگەر ئێوە ئەو تاوانە گەورانەی پێمان ڕاگەیاندوون نەیکەن و خۆتان دوورە پەرێز بگرن. وە ﴿إِنَّ اللَّهَ لَا يَغْفِرُ أَن يُشْرَكَ بِهِ وَيَغْفِرُ مَا دُونَ ذَٰلِكَ لِمَن يَشَاءُ﴾[4] خودا لەوانە خۆش نابێ کە بڵێن خودا هاوکاری هەیە، لەمەبەدەر هەرکەسێ خوا ویستی لێ بێت، لێی دەبورێ. وە ﴿وَلَوْ أَنَّهُمْ إِذ ظَّلَمُوا أَنفُسَهُمْ جَاءُوكَ﴾[5] ئەوانەیش لەپا ئەوەی کە ئەو غەدرەیان لە خۆ کرد، ئەگەر بهاتنایە لای تۆ. وە لە ڕیوایەتێکی تردا هاتووە: ﴿وَمَن يَعْمَلْ سُوءًا أَوْ يَظْلِمْ نَفْسَهُ ثُمَّ يَسْتَغْفِرِ اللَّهَ يَجِدِ اللَّهَ غَفُورًا رَّحِيمًا﴾[6] هەرکەسێ کارێکی نالەبار بکات یان غەدرێك لە خۆی بکات، پاشان لە خوا بخوازێ کە بیبەخشێ، دەبینێ کە خودا لێبوردەو دلۆڤانە.[7] پاشان وتی: ئەم فەرموودە

---

[1] الطبري (٧/٥١٠).

[2] النساء (٤٠).

[3] النساء (٣١).

[4] النساء (٤٨).

[5] النساء (٦٤).

[6] النساء (١١٠).

[7] الحاكم (٢/٣٠٥).

سەنەدەکانی سەحیحە. هەرچەندە عەبدوڕەحمان لە باوکیەوە بیستویەتی جیاوازیان هەیە لەوەدا. وە حاکیم ڕیوایەتی کردووە لە ئیبنوعەبباسەوە وتی: پرسیارم لێ بکەن لەبارەی سورەتی نیسائەوە، من بە منداڵی قورئانم خوێندوە. پاشان وتی: ئەم فەرموودە سەحیحە بە مەرجی بوخاری‌و موسلیم بەڵام خۆیان نەیانهێناوە[1].

بِسْمِ اللَّهِ الرَّحْمَٰنِ الرَّحِيمِ

﴿يَٰٓأَيُّهَا ٱلنَّاسُ ٱتَّقُوا۟ رَبَّكُمُ ٱلَّذِى خَلَقَكُم مِّن نَّفْسٍ وَٰحِدَةٍ وَخَلَقَ مِنْهَا زَوْجَهَا وَبَثَّ مِنْهُمَا رِجَالًا كَثِيرًا وَنِسَآءً ۚ وَٱتَّقُوا۟ ٱللَّهَ ٱلَّذِى تَسَآءَلُونَ بِهِۦ وَٱلْأَرْحَامَ ۚ إِنَّ ٱللَّهَ كَانَ عَلَيْكُمْ رَقِيبًا ﴿١﴾﴾

**فەرماندان بە لەخوا ترسی‌و وەبیر خستنەوەی دروس بوون‌و پەیوەندی خزمایەتی**

خودای گەورە ئەفەرموێت: ﴿يَٰٓأَيُّهَا ٱلنَّاسُ ٱتَّقُوا۟ رَبَّكُمُ ٱلَّذِى خَلَقَكُم مِّن نَّفْسٍ وَٰحِدَةٍ﴾ ئەی خەڵکینە، لە پەروەردگاری خۆتان بترسن، کە هەر ئەوە ئێوەی هەر لە یەك کەس خستۆتەوە. خودای گەورە فەرمان دەکات بە عەبدەکانی کە هەر لەو بترسن‌و هەر ئەویش بپەرستن بە تەنیاو شەریکی نیە. وە ئاگاداریشی داوە کە بە توانای خۆی لەو گیانە دروستی کردون کە ئادەمە (سەلامی خوای لێ بێت).

﴿وَخَلَقَ مِنْهَا زَوْجَهَا﴾ هاوسەرەکەیشی هەر لەو کەسە خستۆتەوە کە حەوایە (سەلامی خوای لێ بێت) لە پەراسوی لای ڕاستی لە دوایەوە دروستی کردووە، ئادەم خەوتبوو، کە خەبەری بوە چاوی پێی کەوت: سەرنجی ڕاکێشاو سۆزی بۆ پەیدا کردو حەوایش سۆزی بۆ ئەو پەیدا کرد وە لەم فەرمودە سەحیحەدا هاتوە: (ئافرەت لە پەراسو دروست کراوە، بێگومان بەشی هەرە لاری پەراسوو بەشی سەرەوەیەتی، جا ئەگەر بتەوێ ڕاستی بکەیتەوە، ئەوا دەیشکێنی‌و ئەگەر ڕات بوارد لەگەڵی ئەوا ڕات بواردوەو لەزەتت لێ وەرگرتوەو هەر لاریشی تێدایە)[2]. پاشان خودای گەورە ئەفەرموێت: ﴿وَبَثَّ مِنْهُمَا رِجَالًا كَثِيرًا وَنِسَآءً﴾ وە لەو دوانەوە پیاوی زۆرو ژنی زۆری وەدی هێنا. واتە: لە ئادەم‌و حەواء پیاوانێکی زۆرو ژنانێکی زۆری دروست کردو لە هەموو وڵاتەکانی دنیادا بڵاوی کردووە بە جیاوازی شێوەو ڕەوشت‌و ڕەنگ‌و زمانیانەوە، لە ئاکامیشا هەموو دەگەڕێنەوە بۆ لای خوداو کۆ دەکرێنەوە لەلای‌و ئەفەرموێت: ﴿وَٱتَّقُوا۟ ٱللَّهَ ٱلَّذِى تَسَآءَلُونَ بِهِۦ وَٱلْأَرْحَامَ﴾ لەو خودایە بترسن کە بەناوی ئەو ئێوە یەکتری سوێند ئەدەن، ئاگاتان لە خزمانیش بێت. واتە: لە خودا بترسن بە گوێڕایەڵی بۆی. ئیبراهیم‌و موجاهیدو حەسەن

---

[1] الحاكم (٢/٣٠١).

[2] فتح الباري (٦/٤١٨).

دەڵێن: ﴿ٱلَّذِي تَسَآءَلُونَ بِهِۦ وَٱلۡأَرۡحَامَ﴾ وەك دەوترێ: داوات لێدەكەم بە ناوی خوداو بە خزمایەتی[1] زەحاك وتی: لەو خودایە بترسن كە بەو پەیمانو بەڵێن دەبەستن[2] وە بترسن لە بڕینی پەیوەندی خزمایەتی، بەڵكو بە چاكی پەیوەندی خزمایەتی بەڕێوە ببەنو هەمیشە بەسەریان بكەنەوە. ئەمە قسەی ئیبنوعەبباسو عیكرمەو موجاهیدو حەسەنو زەحاكو ڕەبیعو كەسانی تریشە.[3] وە هەندێك خوێندویانەتەوە بە (والارحامِ) بە مەجروری بە عەتف لەسەر ئەو زەمیرەكە (بِهِ) واتە: لەو خودایە بترسن كە بەناوی ئەوەوە داوا دەكەن لە یەكترو لە پچڕانی خزمایەتی، وەك موجاهیدو كەسانی تریش وتویانە.[4] خودای گەورە ئەفەرموێت: ﴿إِنَّ ٱللَّهَ كَانَ عَلَيۡكُمۡ رَقِيبٗا﴾ خودا هەمیشە چاودێرە بەسەتانەوە. ئاگای لە هەموو ئاكارو هەڵسوكەوتێكتانە، وەك لە ئایەتێكی تردا ئەفەرموێت: ﴿وَٱللَّهُ عَلَىٰ كُلِّ شَيۡءٖ شَهِيدٌ﴾ خودا شایەتە بەسەر هەموو شتێكەوە. وە لە فەرموودەی سەحیحا هاتوە كە پێغەمبەری خودا فەرموویەتی: (خودا بپەرستە وەك ئەوەی كە ببینی خۆ ئەگەر تۆ ئەو نەبینی، ئەوە بێگومان خوا تۆ دەبینێ)[5] ئەمە خۆی ڕێنماییو ئاگاداریە لەسەر چاودێری خودا، هەربۆیە خودا باسی سەرەتای مرۆڤی كردووە كە لە بابو دایكێك دروس كراونو كە دەبێ هاوكاری یەكتری بنو بەزەییان بەیەكا بێتەوە. وە لە سەحیحی موسلیما هاتووە. لە فەرموودەیەكی جەریری كوڕی عەبدوڵلای بەجەلیەوە كە پێغەمبەری خودا (ﷺ) كاتێ ئەو چەند كەسەی موزەڕ(مضر) هاتن. عەباكانیان كون كردبوو سەریان لێ دەرهێنا بوو (لە ڕووتیو هەژاریدا) دوای نوێژی نیوەڕۆ هەڵساو وتارێكی دا بۆ ئەو خەڵكە، لە وتارەكەیدا فەرمووی: ﴿يَٰٓأَيُّهَا ٱلنَّاسُ ٱتَّقُواْ رَبَّكُمُ ٱلَّذِي خَلَقَكُم مِّن نَّفۡسٖ وَٰحِدَةٖ﴾ تا ئایەتەكەی تەواو خوێندەوە. وە فەرمووی: ﴿يَٰٓأَيُّهَا ٱلَّذِينَ ءَامَنُواْ ٱتَّقُواْ ٱللَّهَ وَلۡتَنظُرۡ نَفۡسٞ مَّا قَدَّمَتۡ لِغَدٖ﴾[6] ئەی كۆمەڵی خاوەن باوەڕان، دەبێ لە خوا بترسن، با هەركەسێ بێنێتە بەر چاوی خۆی بۆ سبەینێ چی وەپێش خۆی خستوە. پاشان هەڵی نان بۆ خێر كردنو فەرمووی: (دەبا هەركەس خێر بكات لە دینارەكەی لە درهەمەكەی كە صاعەگەنمەكەی لە ساعە خورماكەی)[7] فەرموودەكەی بە تەواوی باس كرد، هەر بەم

---

[1] الطبري (٥١٩/٧).

[2] الطبري (٥١٨/٧).

[3] الطبري (٥٢١/٧-٥٢٢).

[4] الطبري (٥١٩/٧).

[5] فتح الباري (١٤٠/١).

[6] الحشر (١٨).

[7] مسلم (٧٠٥/٢).

شێوەیە ئیمامی ئەحمەدو خاوەن فەرموودەکانی تریش ڕیوایەتیان کردووە لە ئیبنومەسعودەوە لە وتاری حاجەدا (الحاجة)[1] ئەمەیشی تێدا بوو: پاشان سێ ئایەتی تریشی خوێند لەوانە: ﴿يَٰٓأَيُّهَا ٱلنَّاسُ ٱتَّقُواْ رَبَّكُمُ﴾.

﴿وَءَاتُواْ ٱلْيَتَٰمَىٰٓ أَمْوَٰلَهُمْ ۖ وَلَا تَتَبَدَّلُواْ ٱلْخَبِيثَ بِٱلطَّيِّبِ ۖ وَلَا تَأْكُلُوٓاْ أَمْوَٰلَهُمْ إِلَىٰٓ أَمْوَٰلِكُمْ ۚ إِنَّهُۥ كَانَ حُوبًا كَبِيرًا (٢) وَإِنْ خِفْتُمْ أَلَّا تُقْسِطُواْ فِى ٱلْيَتَٰمَىٰ فَٱنكِحُواْ مَا طَابَ لَكُم مِّنَ ٱلنِّسَآءِ مَثْنَىٰ وَثُلَٰثَ وَرُبَٰعَ ۖ فَإِنْ خِفْتُمْ أَلَّا تَعْدِلُواْ فَوَٰحِدَةً أَوْ مَا مَلَكَتْ أَيْمَٰنُكُمْ ۚ ذَٰلِكَ أَدْنَىٰٓ أَلَّا تَعُولُواْ (٣) وَءَاتُواْ ٱلنِّسَآءَ صَدُقَٰتِهِنَّ نِحْلَةً ۚ فَإِن طِبْنَ لَكُمْ عَن شَىْءٍ مِّنْهُ نَفْسًا فَكُلُوهُ هَنِيٓـًٔا مَّرِيٓـًٔا (٤)﴾

### فەرماندان بە پاراستنی ماڵو سامانی هەتیوان

خودای گەورە ئەفەرموێت: ﴿وَءَاتُواْ ٱلْيَتَٰمَىٰٓ أَمْوَٰلَهُمْ ۖ وَلَا تَتَبَدَّلُواْ ٱلْخَبِيثَ بِٱلطَّيِّبِ﴾ ماڵی هەتیو بدەنەوە بە هەیوان، ناپاك بە پاك مەگۆڕنەوە. خودای گەورە فەرمان دەکات بە گەڕاندنەوەی ماڵی هەتیو بۆیان ڕێگری کردووە لە خواردنی ماڵی هەتیوو تێکەڵ کردنی لەگەڵ ماڵی خۆدا. هەر بۆیە فەرموویەتی: ﴿وَلَا تَتَبَدَّلُواْ ٱلْخَبِيثَ بِٱلطَّيِّبِ﴾ سەعیدی کوڕی موسەیبو زوهری وتیان: نەکەن لەڕو لاواز بدەنو قەڵەو وەرگرن بۆ خۆتان ئیبراهیمی نەخەعیو زەحاك وتیان: نەکەن ساختە بدەنو باش وەرگرن سوودی وتی: کەسی وایان هەبووە مەڕی قەڵەوی لە ماڵی هەتیو هەڵدەگرت بۆ خۆیو لە جێگەی مەڕی لاوازی دادەناو دەیوت: مەڕێ بە مەڕێ، درهەمی باشی هەڵدەگرتو درهەمی ساختەی لە جێی دادەنا دەیوت: درهەمێ بە درهەمێ خودای گەورە ئەفەرموێت: ﴿وَلَا تَأْكُلُوٓاْ أَمْوَٰلَهُمْ إِلَىٰٓ أَمْوَٰلِكُمْ﴾ ماڵی ئەوان تێکەڵ ماڵی خۆتان مەکەن. موجاهیدو سەعیدی کوڕی جوبەیرو موقاتیلی کوڕی حەیانو سودیو سوفیانی کوڕی حوسەین وتیان: ماڵی هەتیوان تێکەڵی ماڵی خۆتان مەکەنو هەمووی پێکەوە بخۆن پاشان خودای گەورە ئەفەرموێت: ﴿إِنَّهُۥ كَانَ حُوبًا كَبِيرًا﴾ کە تاوانێکی زۆر گەورەیە. ئیبنوعەبباس وتی: واتە گوناهێکی ئێجگار مەزنە. هەر بەم شێوەیە ڕیوایەت کراوە لە موجاهیدو عیکرمەو سەعیدی کوڕی جوبەیرو حەسەنو ئیبنوسیرینو قەتادەو موقاتیلی کوڕی حەیانو زەحاکو ئەبومالیکو زەیدی کوڕی ئەسلەمو ئەبوسینانیش وتویانە واتە: خواردنی ماڵی هەتیوان لەگەڵ ماڵی خۆتان تاوانێکی گەورەو هەڵەیەکی زۆر مەزنەو لێی دوورکەونەوە.

---

[1] أحمد (٣٥٨/٤)، النسائي (٧٥/٥)، إبن ماجة (٧٤/١)، سەحیحە.

## ڕێگری له ماره کردنی کیژی هەتیو بە مارەیەکی کەمتر

خـودای گـەورە ئەفـەرموێت: ﴿وَإِنْ خِفْتُمْ أَلَّا تُقْسِطُوا فِي الْيَتَامَىٰ فَانكِحُوا مَا طَابَ لَكُم مِّنَ النِّسَاءِ مَثْنَىٰ﴾ ئەگەر لەسەر ئەو کیژە هەتیوانە، لەوە ترسان کە نەتوانن بە شێوەیەکی هەق و ڕەوا لەگەڵیان بجولێنەوە دەتوانن وازیان لێ بێنن و ژنانی تر (چەندێ خۆتان پێتان باشەو پێتان دەشێن) مارە بکەن دوان بن. واتە: ئەگەر لە ژێر دەستی یەکێ لە ئێوەدا کیژێکی هەتیو هەبوو، ترسا لەوەی کە مارەیی هاوشێوەی پێ نەدات، با وازی لێ بێنێ و بچێ ژنی تر مارە بکات، ژن زۆرە، خودا دەرووی لێ نەگرتوە. بوخاری ڕیوایەتی کردووە لە عائیشەوە وتی: پیاوێك کیژێکی هەتیوی لەلا بوو مارەی کرد، کچەکە چەند دارخورمایەکی هەبوو، پیاوەکە لەبەر ئەو دارخورمانە مارەی کردبوو. بەڵام کچەکە هیچ مافێکی (هاوسەرگیری) نەبوو لەگەڵیدا، بەو هۆیەوە ئەم ئایەتە هاتە خوارەوە: ﴿وَإِنْ خِفْتُمْ أَلَّا تُقْسِطُوا فِي الْيَتَامَىٰ﴾ وا دەزانم وتی: ئەو کچە شەریکی بوو لە دارخورماو ماڵەکەیشدا[1] پاشان بوخاری ڕیوایەتی کردووە لە عوروەی کوڕی زوبەیرەوە کە پرسیاری کردووە لە عائیشە (ڕەزای خوای لێ بێت) لەم ئایەتەدا: ﴿وَإِنْ خِفْتُمْ أَلَّا تُقْسِطُوا فِي الْيَتَامَىٰ﴾ عائیشە وتی: ئەی کوڕی خوشکم، ئەم کچە هەتیوە دەبێ لەژێر چاودێری بەرپرسەکەیدا بێ، دەیکاتە شەریکی خۆی لە ماڵیداو، ماڵ و سامان و جوانیەکەی سەرنجی ڕادەکێشێ، ئەو بەرپرسەی دەیەوێت مارەی بکات، بەبێ ئەوەی بە دادپەروەری مارەیەکەی بدات، ئەو مارەییەی خەڵکی دەیداتێ دەبێ ئەمیش پێی بدات، ڕێگری کراوە کە مارە بکرێ مەگین بە دادپەروەری لەگەڵی بجولێتەوەو مارەییەکەیشی وەك کچانی تر بێ و کەمتر نەبێ. وە فەرمان دراوە کە ژنانی تر بخوازن بە ئارەزوی خۆیان جگە لەوانە. عورەوە وتی: عائیشە وتی: پرسیاریان لە پێغەمبەری خودا (ﷺ) کرد دوای ئەم ئایەتە خودای گەورە ئەم ئایەتەی ناردە خوارەوە: ﴿وَيَسْتَفْتُونَكَ فِي النِّسَاءِ﴾[2] پرسیارت لێدەکەن لەبارەی ژنانەوە. عائیشە وتی: وە ئەمەیش هەر لەم ئایەتەدا کە خودای گەورە ئەفەرموێت: ﴿وَتَرْغَبُونَ أَن تَنكِحُوهُنَّ﴾[3] دەتانەوێ لە خۆتانیان مارە بکەن. لەبەر ئەوەی هەتیوە ئەگەر ماڵی کەمی هەبوو زۆر جوان نەبوو مارەیان نەکەن لەبەر ئەوە ڕێگری کراوە لە مارە

---

[1] فتح الباري (٨/٨٧).

[2] النساء (١٢٧).

[3] النساء (١٢٧).

کردنی کچی هەتیو لەبەر ماڵو سامانو جوانیەکەی مەگین بە دادپەروەری لەبەر ئەوەی ئەگەر ماڵیان کەم بوو یان جوان نەبون مارەیان نەکەنو هەقی خۆیان نەدەنێ[1].

### بڕیاردان لەسەر هاوسەرگیری هەتا چوار ژن

خودای گەورە ئەفەرموێت: ﴿مَثْنَىٰ وَثُلَٰثَ وَرُبَٰعَ﴾ دوان بن یا سیان پێکەوە یا چواریش بن هەر ڕەوایە. واتە: جگە لەو کیژە هەتیوانە ئارەزوی خۆتانە ژنانی تر مارە بکەن، هەریەکێ لە ئێوە دەتوانێ دوو ژن یا سێ ژن یا چوار ژن بهێنێ. وەك خودای گەورە لە ئایەتێکی تردا ئەفەرموێت: ﴿جَاعِلِ ٱلْمَلَٰٓئِكَةِ رُسُلًا أُو۟لِىٓ أَجْنِحَةٍ مَّثْنَىٰ وَثُلَٰثَ وَرُبَٰعَ﴾[2] فریشتەکان دوو باڵو سێ باڵو چوار باڵی ردۆتە ڕاسپاردە. واتە: فریشتەی وا هەیە دوو باڵی هەیەو هی واش هەیە سێ باڵو هی واش هەیە چوار باڵی هەیە. ئەمە ئەوە ناگەیەنێ کە فریشتەی تر باڵی زیاتریان نیە، لەبەر بوونی بەڵگە لەسەری بە پێچەوانەی پیاوانەوە کە بڕیاری چوار ژنی بۆ دراوە. وەك ئیبنوعەبباس لەم ئایەتەدا وتی بە کۆی زانایانیش هەر هەمان ڕایان هەیە کە ئەمە ڕێزو منەتێکە خودا دەیکات بەسەر عەبدەکانیا، خۆ ئەگەر دروست بوایە پیاو زیاتر لە چوار ژن بکاتە هاوسەری خۆی خودای گەورە باسی دەکرد. ئیمامی ئەحمەد ڕیوایەتی کردووە لە سالمەوە لە باوکیەوە کە غەیلانی کوڕی سەلەمەی سەقەفی موسوڵمان بوو دە ژنی هەبوو، پێغەمبەر (ﷺ) پێی فەرموو: (چواریان لێ هەڵبژێرە) لە زەمانی عومەردا ژنەکانی تەڵاق داو ماڵەکەی دابەش کرد بەسەر منداڵەکانیا، ئەو هەواڵە گەیشتە عومەرو وتی: من وادەزانم شەیتان قسەی دزیوەو بیستویەتی تۆ دەمریتو ئەوەی خستۆتە دڵتەوە، لەوانەیە تۆ ماوەیەکی کەم بژیتو بمری. سوێند بە خودا دەبێ ژنەکانت بگێڕیتەوە لای خۆتو ماڵەکەشیان پێ بدەیتەوە یان دەبێ میرات لە ماڵو سامانت بەرنو فەرمانیش ئەدەم گۆڕەکەت بەردەباران بکرێ وەك چۆن گۆڕی ئەبوڕیغال بەردەباران کرا. هەر بەم شێوەیە شافیعیو تیرمیزیو ئیبنوماجەو دارەقوتنی و بەیهەقیو کەسانی تریش ڕیوایەتیان کردووە. هەتا دەگاتە: (چواریان لێ هەڵبژێرە) پاشماوەی ئەم فەرمودەیە لە بەسەرهاتەکەی عومەردا ئیمامی ئەحمەد هێناویەتی.[3] ئەمە ئەوە دەگەیەنێ کە ئەگەر دروست بوایە زیاتر لە چوار ژن مارە بکرێت. پێغەمبەر (ﷺ) ڕێگەی دەدا دە ژنەکە لەلای (غەیلان) بمێنێتەوەو موسوڵمان بن لەگەڵیا. کاتێ کە فەرمانی پێدا کە هەر چوار ژن بهێڵێتەوەو ئەوانەی تر واز لێ بێنێ.

---

[1] فتح الباري (٨/٨٧).

[2] فاطر (١).

[3] أحمد (٢/١٤)، الام (٥/٤٩)، التيرميزي (١١٢٨)، إبن ماجة (١٩٥٣)، سنن الدار القطنى (٣/٢٧١)، البيهقي (٧/١٨٢)، فەرموودەیەکی حەسەنە.

ئەمە بەڵگەیە لەسەر ئەوە کە بە هیچ شێوەیەك زیاتر لە چوار ژن دروست نیە، کەواتە کەس بۆی نیە لە چوار ژن زیاتر بێنێو مارەی بکات خودای گەورە خۆی باشتر دەزانێ.

**ڕازی بوون بە مارەکردنی یەك ئافرەت، کاتی ترس لە دادپەروەری لە نێوانیاندا**

خودای گەورە ئەفەرموێت: ﴿فَإِنۡ خِفۡتُمۡ أَلَّا تَعۡدِلُواْ فَوَٰحِدَةً أَوۡ مَا مَلَكَتۡ أَيۡمَٰنُكُمۡ﴾ ئەگەر ترسان کە نەتوانن ژنەکانتان وەك یەك تەماشا بکەن، با یەکێك بێ، یان لەگەڵ ئەوانەدا ڕابوێرن کە بونەتە مولکی خۆتان. واتە: ئەگەر ترسان لەوەی لە چەند ژنیدا دادپەروەر نەبن وەك خودای گەورە ئەفەرموێت: ﴿ وَلَن تَسۡتَطِيعُوٓاْ أَن تَعۡدِلُواْ بَيۡنَ ٱلنِّسَآءِ وَلَوۡ حَرَصۡتُمۡ ﴾[1] ئێوە هەرچەند هەوڵیش بدەن، هەرگیز ناتوانن لەگەڵ ژنانی خۆتاندا بێ جیاوازی ڕەفتار بکەن. کەواتە، هەرکەسێ لەوە ترسا کە وەك یەك هەڵسوکەوتیان لەگەڵا بکات، با یەك ژن بێنێ، یان لەگەڵ کەنیزەکانیدا ڕابوێرن، چونکە کات دابەش کردن بۆ ئەوان واجب نیە، بەڵکو شتێکی چاکەو کارێکی باشی کردووە. هەرکەسیش پێی هەڵنەسێ هیچ گوناهی ناکات. ﴿ذَٰلِكَ أَدۡنَىٰٓ أَلَّا تَعُولُواْ﴾ بۆ خۆپاراستن لەوەی دادپەروەر نەبن، ئەمە کارێکی پەسەندە. واتە: کە غەدر نەکەن. ئیبنوئەبی حاتەم ڕیوایەتی کردووە لە ئیبنومەردەویەیو ئەبوحاتەمی کوڕی حەبانەوە لە سەحیحەکەیدا لە عائیشەوە لە پێغەمبەرەوە (ﷺ). ﴿ذَٰلِكَ أَدۡنَىٰٓ أَلَّا تَعُولُواْ﴾ فەرمووی: (غەدر مەکەن).[2] ئیبنوئەبی حاتەم وتی: باوکم وتی: ئەمە فەرمودەیەکی هەڵەیە. ڕاستیەکەی ئەم فەرموودە لە عائیشەوە مەوقوفە. ئیبنوئەبی حاتەم وتی: ڕیوایەت کراوە لە ئیبنوعەبباسو عائیشەو موجاهیدو عیکرمەو حەسەنو ئەبومالیكو ئەبوزەڕینو نەخەعیو شەعبیو زەحاكو عەتای خۆراسانیو قەتادەو سوودیو موقاتیلی کوڕی حەیان کە وتویان: لامەدەنو ستەم مەکەن[3].

**مارەیی دان واجبە**

خودای گەورە ئەفەرموێت: ﴿وَءَاتُواْ ٱلنِّسَآءَ صَدُقَٰتِهِنَّ نِحۡلَةً﴾ وە پێشکەشیەك مارەیی ژنەکان بدەن. عەلی کوڕی ئەبوتەلحە وتی لە ئیبنوعەبباسەوە: (النحلة) مارەیی.[4] موحەممەدی کوڕی ئیسحاق وتی لە زوهریەوە لە عوروەوە لە عائیشەوە مارەیی فەرزە. موقاتیلو قەتادو ئیبنوجورەیج وتیان: مارەیی

---

[1] النساء (١٢٩).

[2] إبن حبان (٦/١٣٤).

[3] الطبري (٧/٥٤٩-٥٥١).

[4] الطبري (٧/٥٥٣).

فەریزەیەکە، ئیبنوجورەیج وتی: مارەیییەکی دیاری کراوە[1] ئیبنوزەید وتی: مارەیی لە وتەی عەرەبدا واتە: واجب، دەڵێ: مارەیی مەکە بە شتێکی واجب نەبێ بۆی. هیچ کەسێ بۆی نیە بێجگە لە پێغەمبەر (ﷺ) کە ژنێ مارە بکات بە مارەیەکی واجب نەبێ، وە نابێ ناوی ئەو مارەییە بە درۆوە بێ‌و ڕاست نەبێ.[2] کورتەی باسەکە ئەوەیە پێویستە لەسەر ئەو پیاوە کە مارەیی بدات بەو ژنە. وە دەبێ ئارەزوی دڵیشیانی لەسەر بێ. وە ڕێگە نادرێ بەو ژنە مارەیییەکەی بدات بە ئارەزوی خۆی. هەر بەو شێوەیە پێویستە کە مارەیییەکە بدرێ بە ژنەکەو پێی ببەخشرێ، ئەگەر ژنەکە دوای دیاری کردنی مارەیییەکە بە ئارەزوی خۆی مارەیییەکەی یان شتێکی لە مارەیییەکەی دا بە پیاوەکەی، ئەوە پاك‌و حەڵاڵە هەر بۆیە خودای گەورە ئەفەرموێت: ﴿فَإِن طِبْنَ لَكُمْ عَن شَيْءٍ مِّنْهُ نَفْسًا فَكُلُوهُ هَنِيٓـًٔا مَّرِيٓـًٔا﴾ ئەگەر بە دڵ پێیان خۆش بوو بە بەخشینی شتێك لەو (مارەییە) بە ئێوە. بیخۆن بە خۆشی‌و بە حەڵاڵی (نۆشی گیانتان بێت).

﴿وَلَا تُؤْتُوا۟ ٱلسُّفَهَآءَ أَمْوَٰلَكُمُ ٱلَّتِى جَعَلَ ٱللَّهُ لَكُمْ قِيَٰمًا وَٱرْزُقُوهُمْ فِيهَا وَٱكْسُوهُمْ وَقُولُوا۟ لَهُمْ قَوْلًا مَّعْرُوفًا ﴿٥﴾ وَٱبْتَلُوا۟ ٱلْيَتَٰمَىٰ وَعَلَى ٱلْمَوْلُودِ لَهُۥ رِزْقُهُنَّ وَكِسْوَتُهُنَّ بِٱلْمَعْرُوفِ ۚ لَا تُكَلَّفُ نَفْسٌ إِلَّا وُسْعَهَا حَتَّىٰٓ إِذَا بَلَغُوا۟ ٱلنِّكَاحَ فَإِنْ ءَانَسْتُم مِّنْهُمْ رُشْدًا فَٱدْفَعُوٓا۟ إِلَيْهِمْ أَمْوَٰلَهُمْ ۖ وَلَا تَأْكُلُوهَآ إِسْرَافًا وَبِدَارًا أَن يَكْبَرُوا۟ ۚ وَمَن كَانَ غَنِيًّا فَلْيَسْتَعْفِفْ ۖ وَمَن كَانَ فَقِيرًا فَلْيَأْكُلْ بِٱلْمَعْرُوفِ ۚ فَإِذَا دَفَعْتُمْ إِلَيْهِمْ أَمْوَٰلَهُمْ فَأَشْهِدُوا۟ عَلَيْهِمْ ۚ وَكَفَىٰ بِٱللَّهِ حَسِيبًا ﴿٦﴾﴾

## چاودێری خستنە سەر کەم ئاوەزان

خودای گەورە ڕێگری کردووە لە ماڵ‌و سامان خستنە ژێر دەستی کەم ئاوەزان کە هەڵسوکەوتی پێوە بکەن، چونکە خودا کردویەتی بە هۆکاری ژیانی خەڵکی تا بازرگانی پێوە بکەن‌و ژیانی خۆیانی پێ دابین بکەن. ئا لێرەدا چاودێری دەخرێتە سەر کەم ئاوەزان کە چەند جۆرێکن، جاری وا هەیە چاودێری لەسەر منداڵە، جاری وا هەیە ئەو چاودێریە دەخرێتە کەسێ کە باش هەڵسوکەوت ناکات ئەو ماڵە لەبەر کەم ئاوەزی یان ئاینی، جاری واش هەیە ئەو کەسە چاودێری دەخرێتە سەری لەبەر مایە پوچی‌و موفلیسی، مایەپوچ ئەو کەسەیە کە قەرزاریەکی زۆر تووشی دێت، ماڵ‌و سامانەکەی بەشی قەرزەکانی ناکات. کاتێ کە خاوەن قەرزەکان لە دادا داوای چاودێری لەسەر تۆمار دەکەن‌و چاودێری دەخرێتە سەر. زەحاك وتی لە ئیبنوعەبباسەوە لەم ئایەتەدا: ﴿وَلَا تُؤْتُوا۟ ٱلسُّفَهَآءَ أَمْوَٰلَكُمُ ٱلَّتِى جَعَلَ ٱللَّهُ لَكُمْ قِيَٰمًا﴾ ماڵی خۆتان (کە خودا کردویەتە مایەی ژیانتان) مەدەنە دەست کەم ئاوەزان. منداڵەکانتو

---

[1] الطبري (٧/٥٥٣).

[2] الطبري (٧/٥٥٣).

ژنان.[1] ئیبنومەسعودو حەکەمی کوڕی عوێینەو حەسەنو زەحاکیش هەر وتویانە: مەبەست پێی ژنانو منداڵانە[2] سەعیدی کوڕی جوبەیر وتی: مەبەست پێی هەتیوانە.[3] موجاهیدو عیکرمەو قەتادە وتیان: مەبەست پێی ژنانە[4].

**فەرماندان بە خەرج کردنی ماڵ بەسەر ئەوانەی چاودێریان لەسەرە بە ڕووخۆشیەوە**

خودای گەورە ئەفەرموێت: ﴿وَٱرۡزُقُوهُمۡ فِيهَا وَٱكۡسُوهُمۡ وَقُولُواْ لَهُمۡ قَوۡلٗا مَّعۡرُوفٗا﴾ بەلام جلو بەرگو بژێویان لە ماڵی خۆتان دابین کەنو بە ڕووی خۆشەوە بیان دوێنن. عەلی کوڕی ئەبوتەلحە زتی لە ئیبنوعەبباسەوە: کە دەڵێت: پشت مەبەستە بە ماڵو سامانەکەتو ئەوەی خودا داویەتیە دەستتو کردویەتە هۆی بژێویت، ئەیدەیت بە منداڵەکانتو هاوسەرەکەت. دوا ئەوەی کە پێیان ئەدەی سەیرکە بزانە چیان پێ ماوە، پارێزگاری لە ماڵو سامانەکەت بکەو بە چاکی خەرجی بکە. وە تۆخۆت خەرجیان بدەو جلو بەرگو هاوکاریو بژێویان بدە[5] موجاهید وتی: ﴿وَقُولُواْ لَهُمۡ قَوۡلٗا مَّعۡرُوفٗا﴾ واتە: چاکەیان لەگەلا بکەو بەسەریان بکەرەوە. ئەم ئایەتە پیرۆزە چاکەکردنی دەستەبەر کردووە بۆ ماڵو منداڵو ئەو کەسانەی کە چاودێریان دەخرێتە سەر. بە هەڵسان بە خەرجی بۆیان لە جلو بەرگو ڕۆزیو بە قسەی خۆش لەگەلا کردنو ڕەوشتی جوان جولانەوە لەگەڵیان.

**فەرماندان بە تاقیکردنەوەی هەتیوانو گەڕاندنەوەی ماڵو سامانەکانیان بۆیان کاتێ کە پێگەیشتن**

خودای گەورە ئەفەرموێت: ﴿وَٱبۡتَلُواْ ٱلۡيَتَٰمَىٰ﴾ هەتیوان تاقی بکەنەوە، ئیبنوعەبباسو موجاهیدو حەسەنو سوودیو موقاتیلی کوڕی حەیان وتیان: واتە هەتیوان تاقی بکەنەوە[6] ﴿حَتَّىٰٓ إِذَا بَلَغُواْ ٱلنِّكَاحَ﴾ هەر کاتێ گەیشتنە تەمەنی ژن هێنانو شوو کردن. موجاهید وتی: واتە: بالغ دەبن[7] کۆمەڵێ لە زانایان دەڵێن: بالغ بوون لە گەنجدا، جاری وا هەیە بە شەیتانی بوونە، ئەو کەسە لە خویدا دەبینێو ئاوی دێتەوە بە هەڵقولان کە منداڵ لەوە پەیدا دەبێ. لە سونەنی ئەبوداوودا هاتووە لە عەلیەوە، وتی

---

[1] الطبري (٧/٥٦٢).
[2] الطبري (٧/٥٦٢).
[3] الطبري (٧/٥٦٣).
[4] الطبري (٧/٥٦٤).
[5] الطبري (٧/٥٧٠).
[6] الطبري (٧/٥٧٤).
[7] الطبري (٧/٥٧٥).

لە پێغەمبەری خوداوە وەرم گرتوە (ﷺ) فەرموویەتی: (دوای شەیتانی بوون هەتیوی نیە بێ دەنگی ڕۆژێکیشی بۆ شەو نیە).[1] وە لە فەرموودەیەکی ترا لە عائیشەو هاوەڵەکانی تری پێغەمبەرەوە (ﷺ) هاتوە، کە پێغەمبەر (ﷺ) فەرموویەتی: (قەڵەم هەڵگیراوە لەسەر سێ کەس لەسەر منداڵێ تا باڵغ دەبێ، لەسەر خەوتویەك هەتا خەبەری دەبێتەوە، وە لەسەر شێتێ هەتا بێدار دەبێتەوە).[2] یان هەرکەسێ پانزە ساڵ تەمەن تەواو بکات ئەمەیش لەو فەرموودەیەوە هاتوە کە لە هەردوو سەحیحەکەدا هاتوە لە ئیبنوعومەرەوە وتی: پیشانی پێغەمبەر (ﷺ) درام لە ڕۆژی ئوحودا من تەمەنم چواردە ساڵ بوو ڕێگەی پێ نەدام، وە لە ڕۆژی خەندەقا پیشان درام کە من تەمەنم پانزە ساڵ بوو ڕێی پێدام، عومەری کوڕی عەبدولعەزیز کاتێ ئەم فەرمودەی پێ گەیشت وتی: ئەمە جیاوازی نێوان منداڵو گەورەیە.[3] جیاوازی لە نێوان زانایاندا هەبوە لەسەر دەرهاتنی مووی زێر لە دەوری شەرمگە. بەڵام ڕاستتر باڵغ بوونەو فەرموودە لەو بارەیەوە هاتوە، وەك ئەم فەرموودەیە کە ئیمامی ئەحمەد ڕیوایەتی کردووە لە عەتیەی قورەزیەوە (ڕەزای خوای لێ بێت) وتی: پیشانی پێغەمبەری خودا (ﷺ) دراین لە ڕۆژی قورەیزەدا، (القُريظة) هەرکەسێ مووی لێ دەرهاتبوو کوژرا، وە هەرکەسێ مووی لێ دەرنەهاتبوو بەردرا. من یەکێك بووم لەو کەسانە کە مووم لێ دەرنەهاتبوو بەردرام.[4] هەر چوار زانایانی فەرموودە بەم شێوەیە هێناویانە[5] تیرمیزی وتی: فەرموودەیەکی حەسەنی سەحیحە.

پاشان خودای گەورە ئەفەرموێت: ﴿فَإِنْ ءَانَسْتُم مِّنْهُمْ رُشْدًا فَٱدْفَعُوٓا۟ إِلَيْهِمْ أَمْوَٰلَهُمْ﴾ ئەگەر هەستی ژیریتان تیا کردن و پێ گەیشتن ئەوا ماڵو سامانەکەیان بدەنەوە. سەعیدی کوڕی جوبەیر وتی: ئەگەر زانیتان دینیان باشەو ماڵەکانی خۆیان دەپارێزن. هەر بەم شێوەیەش ڕیوایەت کراوە لە ئیبنوعەبباسو حەسەنی بەسریو چەندین لە زانایانی تریشەوە[6] ئاین زانەکانیش وتویانە: هەرکاتێ منداڵ گەیشتە ئەوەی مەسڵەحەتی دینو ماڵو سامانی خۆی بزانێ، چاودێریەکەی لەسەر لادەبرێتو ئەو ماڵو سامانەی کە لە ژێر دەستی چاودێرەکەیدا بووە پێی ئەدرێتەوە، بەو ڕێگەی کە دانراوە.

---

[1] أبوداود (٣/٢٩٣)، حەسەنە.

[2] أبوداود (٤/٥٥٨–٥٦٠)، فەرموودەیەکی باشە (جيد).

[3] البخاري (٢٦٦٤)، مسلم (١٨٦٨).

[4] أحمد (٤:٣١٠)، حەسەنە.

[5] أبوداود (٤/٥٦١)، تحفة الاحوذي (٥/٢٠٧)، النسائي في الكبرى (٥/١٨٥)، إبن ماجة (٢/٨٤٩)، حەسەنە.

[6] الطبري (٧/٥٧٦).

**دروستە هەژار لە ماڵی هەتیو بخوات بە پێی ئەو چاودێریە دەیکەن**

خـودای گـەورە ئەفـەرموێت: ﴿وَلَا تَأْكُلُوهَآ إِسْرَافًا وَبِدَارًا أَن يَكْبَرُوا۟﴾ ماڵـەکانیان بـە زیـادەڕەوی و بەپەلە مەخۆن نەوەك گەورە ببن (و لێتان وەرگرنەوە) خودای گەورە ڕێگری کردووە لە خواردنی ماڵی هەتیوان لەبەر پێویستیەکی زۆر نەبێ ﴿إِسْرَافًا وَبِدَارًا﴾ لەبەر ئـەوەی نـەکات بـاڵغ بـبن لـە پـێش بـاڵغ بونیاندا، ﴿وَمَن كَانَ غَنِيًّا فَلْيَسْتَعْفِفْ﴾ کێ دەوڵەمەندە خۆی بپارێزێ، هیـی لـێ نـاخوات. ﴿وَمَن كَانَ فَقِيرًا فَلْيَأْكُلْ بِالْمَعْرُوفِ﴾ کێش هەژارە هەر ئەوەندەی کە پێویستی ژیانیەتی لێی بخوات. ئیبنوئـەبی حاتەم ڕیوایەتی کردووە لە عائیشەوە وتی: ئەم ئایەتە لەسەر بەخێوکـەری هـەتیوان هاتۆتـە خـوارەوە ﴿وَمَن كَانَ غَنِيًّا فَلْيَسْتَعْفِفْ وَمَن كَانَ فَقِيرًا فَلْيَأْكُلْ بِالْمَعْرُوفِ﴾ بەپێی ئەو سەرپەشتیەی کـە دەیکـات[1] بوخاریش ڕیوایـەتی کـردووە.[2] ئیمـامی ئەحمـەد ڕیوایـەتی کـردووە لـە عـەمری کـوڕی شـوعەیبەوە لـە باوکیەوە لە باپیریەوە: کە پیاوێ پرسیاری لە پێغەمبەری خودا کردووە وتویەتی: مـاڵ و سـامانم نیـەو هەتیویشم هەیە؟ فەرمووی: (لە ماڵ و سامانی هەتیوەکەت بخۆ دەست بڵاو بـە فـیڕۆ دەرو مەبەسـتت ماڵ خواردن و پاراستنی ماڵی خۆت نـەبێ، یـان فـەرمووی بیکـەیتـە قوربـانی ماڵەکـەی خـۆت)[3] خـودای گەورە ئەفەرموێت: ﴿فَإِذَا دَفَعْتُمْ إِلَيْهِمْ أَمْوَالَهُمْ﴾ هەرکاتێکیش ماڵەکەیان ئەدەنەوە. واتەی دوای ئەوەی کە باڵغ دەبن و دەزانن ئاوەزیان تەواوە. ئەو کاتە ماڵەکانیان بدەنـەوەو ﴿فَأَشْهِدُوا۟ عَلَيْهِمْ﴾ بـا شـایەت ئاگایـان لـێ بێـت، ئەمـە فـەرمانی خودایـە دەربـارەی ئـەو کەسـانەی چاودێری هـەتیوان دەکـەن کـە شایەتیان لەسەر بگرن و ماڵەکانیان بدەنەوە کـە هـەتیوەکان بـاڵغ بـوون. بـۆ ئـەوەی هـیچ کەسـێ لـەو هەتیوانـە نـەڵێن وەرمـان نـەگرتوە. پاشـان خـودای گـەورە ئەفـەرموێت: ﴿وَكَفَىٰ بِٱللَّهِ حَسِيبًا﴾ بـۆ لێپرسینەوەش هەر خوا بەسە. واتە: خـودا بەسـە کـە چاودێر و شـایەت بـێ دەربـارەی ئـەو هەتیوانـە لەکاتی وەرگرتنەوەی ئەو ماڵەدا، ئایا بـە تـەواوی و بـێ کـەم و کـوڕی و بـێ لادان و خەیانـەت و فروفێڵ هەمووی دراوەتەوە یا نەدراوەتەوە؟ خودا خۆی ئاگای لە هەموو شتێکە. بۆیە لـە سـەحیحی موسـلیما هاتوە کە پێغەمبەری خودا (ﷺ) فەرموویەتی: (ئەی ئەبوزەڕ من وا تۆ دەبینم لاوازی، من ئـەوەی بـۆ

[1] الطبري (٧/٥٩٣).

[2] فتح الباري (٨/٨٩).

[3] مسند أحمد (٢/٢١٥-٢١٦)، فەرموودەیەکی باشە (جید).

خۆم پێم خۆشە بۆ تۆش پێم خۆشە، سەرپەرشتی دوو کەس مەکرە ئەستۆی خۆت. ماڵی هەتیویش مەکرە لای خۆت)[1].

﴿لِّلرِّجَالِ نَصِيبٌ مِّمَّا تَرَكَ ٱلْوَٰلِدَانِ وَٱلْأَقْرَبُونَ وَلِلنِّسَآءِ نَصِيبٌ مِّمَّا تَرَكَ ٱلْوَٰلِدَانِ وَٱلْأَقْرَبُونَ مِمَّا قَلَّ مِنْهُ أَوْ كَثُرَ نَصِيبًا مَّفْرُوضًا ﴿٧﴾ وَإِذَا حَضَرَ ٱلْقِسْمَةَ أُو۟لُوا۟ ٱلْقُرْبَىٰ وَٱلْيَتَٰمَىٰ وَٱلْمَسَٰكِينُ فَٱرْزُقُوهُم مِّنْهُ وَقُولُوا۟ لَهُمْ قَوْلًا مَّعْرُوفًا ﴿٨﴾ وَلْيَخْشَ ٱلَّذِينَ لَوْ تَرَكُوا۟ مِنْ خَلْفِهِمْ ذُرِّيَّةً ضِعَٰفًا خَافُوا۟ عَلَيْهِمْ فَلْيَتَّقُوا۟ ٱللَّهَ وَلْيَقُولُوا۟ قَوْلًا سَدِيدًا ﴿٩﴾ إِنَّ ٱلَّذِينَ يَأْكُلُونَ أَمْوَٰلَ ٱلْيَتَٰمَىٰ ظُلْمًا إِنَّمَا يَأْكُلُونَ فِى بُطُونِهِمْ نَارًا ۖ وَسَيَصْلَوْنَ سَعِيرًا ﴿١٠﴾﴾

**فەرماندان بە دابەش کردنی میراتیو هاوکاری ئەوانەی کە ئامادەی دابەش کردنی ئەو میراتیە دەبن با شتێکی کەمیش بێ**

سەعیدی کوڕی جوبەیرو قەتادە وتیان: بت پەرستەکان ماڵیان هەر بۆ پیاوی گەورە دادەنا لە میراتی بەشی ژنو منداڵیان نەئەدا خودای گەورە ئەم ئایەتەی ناردە خوارەوە: ﴿لِّلرِّجَالِ نَصِيبٌ مِّمَّا تَرَكَ ٱلْوَٰلِدَانِ وَٱلْأَقْرَبُونَ وَلِلنِّسَآءِ نَصِيبٌ مِّمَّا تَرَكَ ٱلْوَٰلِدَانِ وَٱلْأَقْرَبُونَ مِمَّا قَلَّ مِنْهُ أَوْ كَثُرَ نَصِيبًا مَّفْرُوضًا﴾ دایكو باوكو خزمی نزیك (كەم بێ یا زۆر) نێرینە بەشی خۆی هەیەو مێینەش تیا بەشدارەو بەشیان بۆ بڕیار دراوە. واتە: هەموو لەو میراتەدا وەك یەكن لە فەرمانی خوادا. هەرچەندە هەركەسە بەپێی دوورو نزیكی لە بەشەكەیدا جیاوازی هەیە لە مردوەكەوە، یا ژنیەتی، وەك كەسێ وایە كە لە پشتی خۆیەتی یان خۆشی دەوێت. ئیبنومەردەوەیهی ڕیوایەتی كردووە لە جابیرەوە، وتی: ئوموكوجە هات بۆ لای پێغەمبەری خودا (ﷺ) وتی: ئەی پێغەمبەری خودا (ﷺ) دوو كچم هەیەو باوكیان مردوەو هیچ شتێكیان نیە. خودای گەورە ئەم ئایەتەی ناردە خوارەوە: ﴿لِّلرِّجَالِ نَصِيبٌ مِّمَّا تَرَكَ ٱلْوَٰلِدَانِ وَٱلْأَقْرَبُونَ﴾ لە ئایەتی میراتدا بەو زوانە بە شێوەیەكی تر باسی دەكەین بە ویستی خوا. پاشان خودای گەورە ئەفەرموێت: ﴿وَإِذَا حَضَرَ ٱلْقِسْمَةَ أُو۟لُوا۟ ٱلْقُرْبَىٰ وَٱلْيَتَٰمَىٰ وَٱلْمَسَٰكِينُ فَٱرْزُقُوهُم مِّنْهُ وَقُولُوا۟ لَهُمْ قَوْلًا مَّعْرُوفًا﴾ ئەگەر لە وەختی دابەش كردنی میراتدا، كەسو كارو هەتیوانو بێ نەوایان لەوێ هەبوون، لەو ماڵە شتێكیان بدەنێو بە ڕووی خۆشەوە بیاندوێنن.[2] بوخاری ڕیوایەتی كردووە لە

---

[1] مسلم (١٤٥٨/٣).

[2] أبوداود (٣١٤/٣).

ئیبنوعەبباســـوە ﴿ وَإِذَا حَضَرَ ٱلْقِسْمَةَ أُوْلُواْ ٱلْقُرْبَىٰ وَٱلْيَتَـٰمَىٰ وَٱلْمَسَـٰكِينُ ﴾ دەلێـــت: ئایـــەتێکی پتەوە(محكة) نەسخ نەبوەتەوە.[1] ئیبنوجەریر ڕیوایەتی کردووە لە ئیبنوعەبباسەوە وتی: ئەم ئایەتە هەر ماوەتەوەو کاری پێ کراوە.[2] وە سەوری وتی لە ئیبنوئەبی نەجیحەوە لە موجاهیدەوە لەم ئایەیەتەدا وتی: ئەمە واجبە لەسەر ئەهلی میراتگران بەپێی تواناو بژێوی خۆیان.[3] هەر بەم شێوەیە ڕیوایەت کراوە لە ئیبنومەسعودو ئەبوموساو عەبدوڕەحمانی کوڕی ئەبوبەکرو ئەبولعالیەو شەعبیو حەسەنەوە.[4] ئیبنوسیرینو سەعدی کوڕی جوبەیرو مەکحولو ئیبراهیمی نەخەعیو عەتای کوڕی ئەبی ڕیباحو زوهریو یەحیای کوڕی یەعمور وتیان: ئەوە واجیبە. وتراوە: ئەم وەسیێتە مردوو دەیکات.

وتراویشە: ئەم ئایەتە نەسخ بوەتەوە. عەوفی وتی لە ئیبنوعەبباسەوە، وتی: ﴿ وَإِذَا حَضَرَ ٱلْقِسْمَةَ ﴾ ئەگەر لە دابەش کردنی میراتدا. چەندین لە زانایانی تریش وتویانە، ئەگەر لەکاتی دابەش کردنی میراتیدا، ئەو کەسو کارە هەژارو هەتیوو دەس کورتانە ئامادەی دابەش کردنی میرات بوون، بە دڵ ئارەزوی ئەو ماڵە زۆرە دەکەن میراتیش نایانگرێتەوەو بەشیان نیەو چاویان لێیە ئەم دەبیاتو ئەم دەبیات، ئەمان بێ بەشنو هیچ وەرناگرن. خودای گەورەی بەسۆزو بەزەیی فەرمان دەکات کە لەو ماڵە میراتیە شتێکیان بدەنێ وەك چاکەیە لەگەڵیانو خێرێك پێیانو پیاوەتیەك دەربارەیانو دڵنەوایی کردنیان.

**دادپەروەری لە وەسیەت کردندا**

خـــودای گـــەورە ئەفـــەرموێت: ﴿ وَلْيَخْشَ ٱلَّذِينَ لَوْ تَرَكُواْ مِنْ خَلْفِهِمْ ذُرِّيَّةً ضِعَـٰفًا خَافُواْ عَلَيْهِمْ فَلْيَتَّقُواْ ٱللَّهَ وَلْيَقُولُواْ قَوْلًا سَدِيدًا ﴾ ئەو کەسانەی منداڵانی سەروپێچکەی بێ دەستەڵات لە دوای خۆیان بەجێدێڵن، با لە وەسیەت کردنیدا، ترسی خوایان لە دڵدا بێو شتێکی وا لە پاش خۆیان ڕاسپێرن هیچ ناهەقی تێدا نەبێ. عەلی کوڕی ئەبوتەلحە وتی لە ئیبنوعەبباسەوە وتی: ئەمە دەربارەی پیاوێکە خەریکە دەمرێت، پیاوێ گوێی لێیەتی وەسیەتێك دەکات کە زیانی هەیە بۆ ئەوانەی میراتی لێ دەبەن. خودای گەورە فەرمانی داوە، کە ئەو کەسانەی گوێیان لە وەسیەتی ئەو پیاوەیە، پێی بڵێن لە خوا بترسێو هەوڵ بدا کە یارمەتی بداو وەسێتەکەی بۆ ڕاست بکاتەوەو تێی بگەیەنێ کە چۆن پێی خۆشە ئەو وەسێتە دەکات بۆ کەسو کاری بێ بەش نەبن بەو شێوەیە چاوەڕوانی کەسەکانی تریش

---

[1] فتح الباري (٨/٩٠).

[2] الطبري (٨/٨).

[3] الطبري (٨/٨).

[4] الطبري (٨/٨).

بكات‌و ئه‌وانیش بێ به‌ش نه‌كات.[1] موجاهیدو كه‌سانی تریش هه‌ر وایان وتوه[2] وه له هه‌ردوو سه‌حیحه‌كه‌دا هاتووه، كه پێغه‌مبه‌ری خودا (ﷺ) كاتێ چووه لای سه‌عدی كوڕی ئه‌بووه‌قاص‌و سه‌ردانی كرد، وتی: ئه‌ی پێغه‌مبه‌ری خودا (ﷺ) من كه‌سێكی خاوه‌ن ماڵ‌و سامانم، كه‌سیش نیه میراتم لێ بگرێت جگه له كچێك، ئایا دروسته دوو سێ یه‌كی ماڵه‌كه‌م بكه‌م به خێر، فه‌رمووی: (نه‌خێر)، وتم: ئه‌ی نیوه‌ی بكه‌م به خێر؟ فه‌رمووی: (نه‌خێر)، وتی: ئه‌ی سێ یه‌ك، فه‌رمووی: (سێ یه‌كی بكه‌و سێ یه‌كیش زۆره)، پاشان پێغه‌مبه‌ری خودا (ﷺ) فه‌رمووی: (تۆ ئه‌گه‌ر پاشی خۆت منداڵه‌كانت به ده‌وڵه‌مه‌ندی به‌جێ بێڵی باشتره له‌وه‌ی به هه‌ژاری به‌جێیان بێڵی‌و ده‌ست له خه‌ڵكی پان بكه‌نه‌وه)[3].

## هه‌ڕه‌شه له‌و كه‌سانه‌ی ماڵی هه‌تیوان ده‌خۆن

وه وتراوه: مه‌به‌ست به ﴿فَلْيَتَّقُوا اللَّهَ﴾ با له خوا بترسن له ده‌ست خستنه ماڵی هه‌تیوان ﴿وَلَا تَأْكُلُوهَا إِسْرَافًا وَبِدَارًا﴾[4] زیاد له ئه‌ندازه‌و به‌په‌له ماڵیان نه‌خۆن. ئه‌م قسه‌یه ئیبنوجه‌ریر له ڕێگه‌ی عه‌وفیه‌وه گێڕاویه‌ته‌وه له ئیبنوعه‌بباسه‌وه.[5] ئه‌مه قسه‌یه‌كی چاكه ئه‌و ئایه‌ته‌ی كه له دوایه‌وه دێت پشتگیری لێ ده‌كات‌و هه‌ڕه‌شه ده‌كات له‌و كه‌سانه‌ی كه ماڵی هه‌تیوان ده‌خۆن به ناهه‌قی، واته: به‌و شێوه‌یه هه‌ڵوكه‌وت بكه له‌گه‌ڵ منداڵه‌كانیان كه ده‌بیته به‌رپرسیان، وه‌ك چۆن پێویسته هه‌ڵسوكه‌وت بكرێ له‌گه‌ڵ منداڵه‌كانت دوای خۆت. وه ئاگاداریان بكه، كه هه‌ركه‌سێ ماڵی هه‌تیوان بخوات به ناهه‌قی، بێگومان ئاگر ده‌خاته ناو سكی خۆی. هه‌ر بۆیه خودای گه‌وره ئه‌فه‌رموێت: ﴿إِنَّ الَّذِينَ يَأْكُلُونَ أَمْوَالَ الْيَتَامَىٰ ظُلْمًا إِنَّمَا يَأْكُلُونَ فِي بُطُونِهِمْ نَارًا ۖ وَسَيَصْلَوْنَ سَعِيرًا﴾ ئه‌و كه‌سانه‌ی به ناڕه‌وا دارایی هه‌تیوان ده‌خۆن، با بزانن كه ئاگر ده‌خه‌نه ناو سكیان‌و تووشی ئاگرێكی به هه‌ڵپه‌و گڕ ده‌بن. واته: ئه‌و كه‌سانه‌ی ماڵی هه‌تیوان ده‌خۆن به‌بێ هۆكارێ، بێگومان ئاگرێ ده‌خۆن كه كڵپه‌و بڵێسه‌ی دێ له‌ناو سكیاندا له ڕۆژی قیامه‌تدا. وه له هه‌ردوو سه‌حیحه‌كه‌دا هاتوه له ئه‌بوهوره‌یره‌وه كه پێغه‌مبه‌ری خودا (ﷺ) فه‌رموویه‌تی: (خۆ بپارێزن له حه‌وت تاوانه له‌ناوبه‌ره‌كه) وترا: ئه‌ی پێغه‌مبه‌ری خودا (ﷺ) ئه‌وانه كامانه‌ن؟ فه‌رمووی: (شه‌ریك دانان بۆ خودا، جادوو، كوشتنی كه‌سێ

---

[1] الطبري (١٩/٨).

[2] الطبري (٢١/٨).

[3] فتح الباري (٤٢٧/٥)، مسلم (١٢٥٣/٤).

[4] النساء (٦).

[5] الطبري (٢٣/٨).

کە خودا قەدەغەی کردووە مەکین بە هەقی خۆی، خواردنی سوو، خواردنی ماڵی هەتیوان، پشت هەڵکردن (ڕا کردن) لە ڕۆژی پەلاماردااندا، تۆمەتبارکردنی ژنانی ئازادی خاوەن باوەڕی بێ ئاگا).[1]

﴿يُوصِيكُمُ اللَّهُ فِي أَوْلَادِكُمْ ۖ لِلذَّكَرِ مِثْلُ حَظِّ الْأُنثَيَيْنِ ۚ فَإِن كُنَّ نِسَاءً فَوْقَ اثْنَتَيْنِ فَلَهُنَّ ثُلُثَا مَا تَرَكَ ۖ وَإِن كَانَتْ وَاحِدَةً فَلَهَا النِّصْفُ ۚ وَلِأَبَوَيْهِ لِكُلِّ وَاحِدٍ مِّنْهُمَا السُّدُسُ مِمَّا تَرَكَ إِن كَانَ لَهُ وَلَدٌ ۚ فَإِن لَّمْ يَكُن لَّهُ وَلَدٌ وَوَرِثَهُ أَبَوَاهُ فَلِأُمِّهِ الثُّلُثُ ۚ فَإِن كَانَ لَهُ إِخْوَةٌ فَلِأُمِّهِ السُّدُسُ ۚ مِن بَعْدِ وَصِيَّةٍ يُوصِي بِهَا أَوْ دَيْنٍ ۗ آبَاؤُكُمْ وَأَبْنَاؤُكُمْ لَا تَدْرُونَ أَيُّهُمْ أَقْرَبُ لَكُمْ نَفْعًا ۚ فَرِيضَةً مِّنَ اللَّهِ ۗ إِنَّ اللَّهَ كَانَ عَلِيمًا حَكِيمًا ﴿١١﴾﴾

## فەرماندان بە میراتگیری و هاندان بۆ فێربوونی زانستی فەرائیز

ئەم ئایەتە پیرۆزە هەتا کۆتاییەکەی کە خودای گەورە ئەفەرموێت: ﴿يُوصِيكُمُ اللَّهُ فِي أَوْلَادِكُمْ ۖ لِلذَّكَرِ مِثْلُ حَظِّ الْأُنثَيَيْنِ﴾ خودا پێتان ڕادەگەیەنێ کە لە میراتیتان با بۆ نێرینە دوو بەش و بۆ مێینە نیوەی بەشی نێرینە بێ. ئایەتی دوای ئەم ئایەتەیش و ئەو ئایەتەیش لە کۆتایی ئەم سورەتەدا دێت، هەر باسی زانستی فەرائیز دەکات. لەم سێ ئایەتە و ئەوم فەرموودانەش لەم بارەیەوە هاتوە وەك شی کردنەوە وایە بۆ ئەم زانستە، ئێستا باسێ لەوانە دەکەین کە پەیوەندی بەم زانستەوە هەیە، زۆر گرنگی پێدراوە و هانی خاوەن باوەڕان دراوە کە فێری ببن لەبەر گرنگیەکەی. ییبنوعویەینی وتی: فەرائیز بە نیوەی زانیاری دانراوە، چونکە هەموو خەڵکی پێ تاقی دەکرێتەوە.

## هۆی هاتنە خوارەوەی ئەم ئایەتە

بوخاری ڕیوایەتی کردووە لە تەفسیری ئەم ئایەتەدا لە جابیری کوڕی عەبدوڵڵاوە وتی: پێغەمبەری خوداو (ﷺ) ئەبوبەکر لە بەنی سەلەمە بە پێ هاتن بۆ لام سەرم لێ بدەن (نەخۆش بووم) پێغەمبەری خودا کە بینیمی هیچ هۆشم لەسەر خۆم نیە، داوای ئاوی کردو دەست نوێژی پێ گرت، پاشان پرژاندی بەسەرمدا، هۆشم هاتەوە سەر خۆم و وتم: ئەی پێغەمبەری خودا (ﷺ) چ فەرمانێکم پێدەکەی کە بیکەم بە ماڵ و سامانەکەم؟ ئەم ئایەتە هاتە خوارەوە: ﴿يُوصِيكُمُ اللَّهُ فِي أَوْلَادِكُمْ ۖ لِلذَّكَرِ مِثْلُ حَظِّ الْأُنثَيَيْنِ﴾[2] هەر بەم شێوەیە موسلیم و نەسائی ڕیوایەتیان کردوە[3] زانایانی تری فەرموودەیش هەموو

---

[1] فتح الباري (٥/٤٦٢)، مسلم (١/٩٢).

[2] فتح الباري (٨/٩١).

[3] مسلم (٣/١٢٣٥)، النسائي في الكبرى (٦/٣٢٠).

ڕیوایەتیان کردوە[1] فەرموودەیەکی تر هەر لە جابیرەوە لەسەر هۆی هاتنە خوارەوەی ئەم ئایەتە، ئیمامی ئەحمەد ڕیوایەتی کردوە لە جابیرەوە وتی: ژنەکەی سەعدی کوڕی ڕەبیع هات بۆ لای پێغەمبەری خودا (ﷺ) وتی: ئەی پێغەمبەری خودا (ﷺ) ئەم دوو کچە، کچی سەعدی کوڕی ڕەبیعە، باوکیان لەگەڵ تۆدا لە ئوحودا کوژرا، مامەکەیان ماڵەکەی هەڵگرتووە بۆ خۆی. هیچی بۆ بەجێ نەهێشتوون، ناشدرێن بە شوو ئەگەر ماڵیان نەبێ. وتی: پێغەمبەر (ﷺ) فەرمووی: (خودا لەو بارەیەوە بڕیار ئەدا)، وتی: ئایەتی میرات هاتە خوارەوە پێغەمبەری خودا (ﷺ) ناردی بە شوێن مامەکەیانداو فەرمووی: (دوو سێ یەك بدە بە دوو کچەکەی سەعدو هەشت یەکیش بدە بە دایکیان، ئەوەیش ماوەتەوە بۆ تۆیە)[2]، ئەبوداودو تیرمیزیو ئیبنوماجە ڕیوایەتیان کردوە[3] وا دیارە لە فەرموودەی یەکەمی جابیر بەهۆی ئایەتی دوایەوە هاتۆتە خوار لەم سورەتەدا وەك بەو زوانە دێت، چونکە ئەو کاتە هەر خوشکی هەبوو، کچی نەبوو، هەر بە کەلالە میراتی لێ دەبرا (واتە: کەسی نەبوو جگە لە خوشك) بۆیە ئەم فەرموودەمان لێرەدا هێنا لەبەر فەرموودەکەی بوخاری کە باسی هاتنە خوارەوەی ئەم ئایەتەی کردبوو، فەرموودەی دووهەمی جابیرش لە شێوەی هاتنە خوارەوەی ئەم ئایەتە دەچوو. والله أعلم.

## منداڵان میراتی دەبەن، نێرینە دوو بەش و مێینە نیوەی بەشی نێرینە دەبات

خودای گەورە ئەفەرموێت: ﴿ يُوصِيكُمُ ٱللَّهُ فِيٓ أَوۡلَٰدِكُمۡۖ لِلذَّكَرِ مِثۡلُ حَظِّ ٱلۡأُنثَيَيۡنِ ﴾ خودا پێتان ڕادەگەیەنێ: کە لە میراتیتان با بۆ نێرینە دوو بەش و بۆ مێینە نیوەی بەشی نێرینە بێ. واتە: خودا فەرمانتان پێ دەکات کە دادپەروەر بن لە نێوانیاندا، چونکە لە چەرخی نەفامیدا هەموو میراتیان داناوە بۆ نێرینە و مێینەیان لێ بێ بەش کردوە. خودای گەورە فەرمانی دا کە مامەڵە لەگەڵ نێرو مێ بکرێ بە یەکسانی لە ئەسڵی میراتگریدا، بەڵام جیاوازی کردوە لە نێوانیانداو دوو بەشی داناوە بۆ نێرینە و نیوەی بەشی نێرینەشی داناوە بۆ مێینە، ئەمەیش لەبەر پێویستی پیاو بۆ خەرجیو ئەو ئەرکانەی کە زیاتر بەسەرەوەیە و هاتوچۆی بازرگانیو ماندوو بوونی زیاتر بۆ بەدەست هێنانی بژێوی ژیان. بۆیە دوو ئەوەندەی مێینەی پێداوە، هەندێ لە زانا هوشیارو زیرەکەکان لەم ئایەتە پیرۆزەدا کە ئەفەرموێت: ﴿ يُوصِيكُمُ ٱللَّهُ فِيٓ أَوۡلَٰدِكُمۡۖ لِلذَّكَرِ مِثۡلُ حَظِّ ٱلۡأُنثَيَيۡنِ ﴾ ئەمەیان لێ وەرگرتوە، کە

---

[1] فتح الباري (١/١١٨)، مسلم (٣/١٢٣٤)، أبوداود (٣/٣٠٨)، تحفة الاحوذي (٨/٣٦٨)، النسائي (١/٧٧)، إبن ماجة (٢/٩١١).

[2] أحمد (٣/٣٥٢)، فەرموودەیەکی حەسەنە.

[3] أبوداود (٣/٣١٤)، تحفة الاحوذي (٦/٢٦٧)، إبن ماجة (٢/٩٠٨)، حەسەنە.

خودای گەورە زۆر بەسۆزە بۆ دروستکراوەکانی لە باوكو دایك بۆ منداڵەکانی، ئەوسا پێی ڕاگەیاندوون کە چۆن ڕەفتار بکەن لەگەڵیان و ئاگاداریشی کردوون کە لەوان بەبەزەیی ترە بۆیان. وەك لەم فەرموودە سەحیحەدا هاتوە کە پێغەمبەر (ﷺ) ژنێکی دیلی بینی دەگەڕا بە شوێن منداڵەکەیدا، کاتێ دۆزیەوە لەناودیلەکانداو باوەشی پیاکردو گرتی بەسنگیەوە شیری پێدا. پێغەمبەری خودا(ﷺ) فەرمووی بە هاوەڵەکانی: (ئایا وا دەزانن کە ئەمە منداڵەکەی فڕێ بداتە ناو ئاگرکە توانای ئەوەی هەبێ بیکات؟) وتیان: نەخێر، ئەی پێغەمبەری خودا (ﷺ) فەرمووی: (سا سوێند بە خوا، خودا بەبەزەیی ترە بۆ عەبدەکانی لەمە بۆ منداڵەکەی)[1]، بوخاری لێرەدا ڕیوایەتی کردوە لە ئیبنوعەبباسەوە، وتی: ئەو ماڵە هەر بۆ کوڕ بووە. ئەو وەسێتە بۆ باوكو دایکە، ئەوەی ئەوان پێیان خۆش بووە خوا نەسخی کردۆتەوە. بەشی نێرینەی کردە دوو بەشو بەشی مێینە نیوەی بەشی نێرینە داناوە. بەشی باوكو دایکیش بە شەش یەكو سێ یەك داناوە. بۆ ژن هەشت یەكو چوار یەكو بۆ مێرد نیوەو چوار یەکی داناوە: کە هەریەکێکیان بمرن[2].

## میراتی کچ ئەگەر هەر تەنیا خۆی بوو

خودای گەورە ئەفەرموێت: ﴿فَإِن كُنَّ نِسَآءً فَوۡقَ ٱثۡنَتَيۡنِ فَلَهُنَّ ثُلُثَا﴾ ئەگەر ژمارەی مێینە لە دوان زیاتر بوو، دوو بەش لە سێ بەشی میراتەکە ئەبەن. هەندێ کەس وتویانە لەم وشەدا کە خودا ئەفەرموێت: ﴿فَوۡقَ﴾ وشەیەکی زیادەیەو وا دادەنرێ ﴿فَٱضۡرِبُواْ فَوۡقَ ٱلۡأَعۡنَاقِ﴾ وەك خودای گەورە لە ئایەتێکی تردا فەرموویەتی: ئەمە جێی بڕوا نیەو نە لێرەداو نە لەولایش، چونکە لە قورئاندا هیچ شتێکی زیادەو بێ سوود نیەو ئەمە قەدەغە کراوەو ڕێی پێ نەدراوە. پاشان خودای گەورە ئەفەرموێت: ﴿فَلَهُنَّ ثُلُثَا مَا تَرَكَ﴾ دوو بەش لە سێ بەشی میراتەکە ئەبەن. خۆ ئەگەر مەبەستەکە وا بوایە کە ئەوانە دەیڵێن، ئەیفەرموو: (فلهما ثُلثا ما ترك) بەڵکو لە حوکمی دوو خوشکەوە، ئەو کەڵکە وەرگیراوە کە دوو سێ یەك بۆ دوو کچ بێت. وەك لە ئایەتی کۆتاییدا هاتوە، چونکە خودای گەورە بڕیاری دوو سێ یەکی داوە تێدا بۆ دوو خوشك. کاتێ کە دوو خۆشك دوو سێ یەك بەرن، دوو کچ لە پێشترن بۆ میرات گری بە دوو سێ یەك. وە لە پێشەوە لە فەرموودەکەی جابیرا پێغەمبەری خودا (ﷺ) بڕیاری دا بۆ دوو کچەکەی سەعدی کوڕی ڕەبیع بە دوو سێ یەك لە میرات. قورئان و سەنەتیش بەڵگەن لەسەر ئەمە. دیسان خودای گەورە ئەفەرموێت: ﴿وَإِن كَانَتۡ وَٰحِدَةٗ فَلَهَا ٱلنِّصۡفُ﴾ ئەگەر مێینە یەکێ بوو، نیوەی میراتی بۆ ئەمە. خۆ ئەگەر بۆ دوو کچ نیوە بوایە، دیسان دەقێکی لەسەر

---

[1] مسلم (٤/٢١٠٩).

[2] فتح الباري (٨/٩٣).

دەمات. کاتێ کە بڕیار دراوە بەوە بۆ یەك کچ بە تەنیا خۆی، ئەمە بەڵگەیە لەسەر ئەوە کە دوو کچ لە حوکمی سێ کچ دایە، والله أعلم.

### میراتی باوكو دایك

خـودای گـەورە ئەفـەرموێت: ﴿وَلِأَبَوَيۡهِ لِكُلِّ وَٰحِدٖ مِّنۡهُمَا ٱلسُّدُسُ مِمَّا تَرَكَ إِن كَانَ لَهُۥ وَلَدٞ﴾ ئەگـەر مردوو منداڵی لەپاش بەجێ ما، دایكو باوك هەر یەكەیان شەش یەكیان لـەو ماڵە هەیە. باوكو دایك چەند حاڵەتێكیان هەیە:

**حاڵەتی یەكەم:** لەگەڵ منداڵەكاندا كۆ دەبنەوە باوكو دایكەكە هەر یەكەیان شەش یەك لەو میراتـە دەبەن بە فەرز. وە ئەگەر مردوەكە تەنیا كچێكی هەبوو، نیوەی ئەو میراتـە بۆ ئـەو كچەیە بـە فـەرز. باوكو دایكەكەیش هەریەكەو شەش یەكیان لەو میراتیە بەردەكەوێ. باوكەكە شـەش یـەكێكی تـر لـەو میراتە دەبات بە تەعسیب(بالتعصیب) ئا لەوێدا باوكەكە لە هەردوو لاوە میراتی وەردەگرێ بە فەرزو بە تەعسیبیش.

**حاڵەتی دووهەم:** خودای گەورە ئەفەرموێت: ﴿فَإِن لَّمۡ يَكُن لَّهُۥ وَلَدٞ وَوَرِثَهُۥٓ أَبَوَاهُ فَلِأُمِّهِ ٱلثُّلُثُ﴾ ئەگەر هیچ منداڵی نیەو دایكو باوكی میراتەكە بگرن لە سێ یەك بەشێ بۆ دایكە. باوكو دایك هـەر خۆیـانن، كەسیان لەگەڵ نیە، لەم كاتەدا دایك سێ یەك ئەباتو ئەوەی ماوەتەوە باوكەكە هەمووی بە تەعسیب (التعصیب) دەبات. ئەو كاتە باوكەكە دوو ئەوەندەی دایكەكە دەبات كە بە فەرز بۆی دانراوە. ئەگـەر لەم حاڵەتەدا ژنەكەی یا مێردەكەی لەگەڵیانـدا بوایـە. پیاوەكـە نیـوەی میراتەكـەی دەبـرد، ژنەكـەیش چوار یەكی دەبرد. پاشان دایكەكە دوای وەرگرتنی میراتی پیاوەكـە یان ژنەكـە بـە فـەرز سێ یـەكی ئەوەی ماوەتەوە دەبات لەو میراتە. وەك ئەوە هەموو میراتەكە ئەوەی ماوەتەوە بۆ باوكو دایكەكەیـە. خودا نیوەی داناوە بۆ دایكەكـەو لـە هـی باوكەكـە. ئـەو سـێ یەكـەی كـە ماوەتـەوە بـۆ دایكەكەیـەو باوكەكەیش دوو سێ یەك لەو میراتە وەردەگرێت.

**حاڵەتی سێهەمی باوكو دایك:** كۆبونەوەیان لەگەڵ برادا، ئیتر ئەو برانە برای دایكیو باوكی بن یا باوكی یا دایكی. ئەوانە هیچ میراتی نابەن لەگەڵ باوكدا، بەڵام لەگەڵ ئەوەیشا دایك بێ بەش ئەكەن لە سێ یەكو دەیبەن بۆ شەش یەك. لەگەڵ بوونی ئەواندا تـەنیا شـەش یـەك ئـەبات. ئەگـەر هـیچ كەسـی تریان نەبوو جگە لە باوكو ئەم. هەرچی مایەوە باوكەكە ئەیبات. حوكمی كەسانی تریش هـەر حـوكمی براكانی هەیە وەك باسمان كرد لەلای كۆی زانایان ئیبنوئەبی حاتەم ڕیوایەتی كردوە لە قـەتادەوە لـەم دەقەدا كە خودای گەورە ئەفەرموێت: ﴿فَإِن كَانَ لَهُۥٓ إِخۡوَةٞ فَلِأُمِّهِ ٱلسُّدُسُ﴾ ئەگەر مردوو براو خوشكی

بەجێ هێشتبوو، دایك شەش یەکی پێ دەبڕێ. لێرەدا زیان بە دایکەکە دەگەیەنن و میراتیش نابەن. وە تەنیا برایەك لە سێ یەك بێ بەش ناکات، بەلام زیاتر لە برایەك بێ بەشی دەکات لە سێ یەك.

## پێش خستنی قەرز پاشان وەسیەت بەسەر میراتدا

خـودای گـەورە ئەفـەرموێت: ﴿مِنۢ بَعۡدِ وَصِيَّةٖ يُوصِي بِهَآ أَوۡ دَيۡنٍۗ﴾ پـاش دانـەوەی قـەرزو قۆڵـە پێکهێنانی وەسیێتەکە. زانایانی پێشینەو پاشینە کۆ دەنگن لەسەر ئەوە کە قەرز پێش دەخرێ لەسەر وەسیەت دوای ورد بونەیەکی باش لە مەبەستی ئەم ئایەتە پیرۆزە. پاشان خودای گەورە ئەفەرموێت: ﴿ءَابَآؤُكُمۡ وَأَبۡنَآؤُكُمۡ لَا تَدۡرُونَ أَيُّهُمۡ أَقۡرَبُ لَكُمۡ نَفۡعٗاۚ﴾ ئێوە نازانن باوان و منداڵەکانتان کامیان بۆ بـەهرە پێدانتان نزیکترن. واتە: کاتێ کە میراتمان دانا بۆ باوك و دایك و منداڵان، لە ئەسڵی میراتەکە بەشمان بە هەموویان داو بە جیاوازی لەوەی کە لە چەرخی نەفامیدا کاری پێدەکرا، وە بـە جیـاش لـەوەی کە لـە سەرەتای هاتنی ئیسلامیشا کرای پێ دەکرا، کە ئەو ماڵە هەر بۆ باوك بوو، وەسیەتیش هەر بۆ بـاوك و دایك بوو. وەك لە پێشەوە لە ئیبنوعەبباسەوە هاتبوو. خودای گەورە ئەوەی نەسخ کردەوە بە ئەمـەو هەر کەسە بە فەرز بەشی خۆی بۆ داناوەو هەرکەسە بەپێی خۆی، چونکە مرۆڤ جاری وا هەیە سـوودی پێ دەگات لە باوکیەوە، چ سوودی دنیایی یان قیامەتی، یان لە هەردوو لاوە. بەلام لەلای کوڕەوە پێی ناگات. وە بـە پێـچەوانەشەوە. هـەر بۆیـە خـودای گـەورە ئەفـەرموێت: ﴿ءَابَآؤُكُمۡ وَأَبۡنَآؤُكُمۡ لَا تَدۡرُونَ أَيُّهُمۡ أَقۡرَبُ لَكُمۡ نَفۡعٗاۚ﴾ چونکە چاوەڕوانی بەهرە لە هەردوو لا دەکرێ، بۆیە میراتمان بۆ هـەردوولا دانـاو هەردوو لامان وەك یەك لێکردو کەسیانمان بـێ بـەش نـەکرد لـە ئەسـڵی میراتەکەدا والله أعلم. پاشـان خـودای گـەورە ئەفـەرموێت: ﴿فَرِيضَةٗ مِّنَ ٱللَّهِۗ﴾ بڕیارێکە لەلایـەن خـوداوە بۆتـان دانـراوە. واتـە: ئەمەی کە بە درێژی باسمان کرد لە بارەی میراتەوە، کە میرات دانە بە هەندێ زیاتر لە هەندێکی تر لـە میراتگرەکان بڕیارێکی خودایەو فـەرمانی ئـەوە. خـودای زانـای لەکارزانـە شـتەکان لـە شـوێنی خـۆی دادەنێت، هەرکەسەو بەپێی شایستەیی خۆی پێی ئەدات، هـەر بۆیـە ئەفـەرموێت: ﴿إِنَّ ٱللَّهَ كَانَ عَلِيمًا حَكِيمٗا﴾ خودا زانای لەکارزانە.

﴿۞وَلَكُمۡ نِصۡفُ مَا تَرَكَ أَزۡوَٰجُكُمۡ إِن لَّمۡ يَكُن لَّهُنَّ وَلَدٞۚ فَإِن كَانَ لَهُنَّ وَلَدٞ فَلَكُمُ ٱلرُّبُعُ مِمَّا تَرَكۡنَۚ مِنۢ بَعۡدِ وَصِيَّةٖ يُوصِينَ بِهَآ أَوۡ دَيۡنٖۚ وَلَهُنَّ ٱلرُّبُعُ مِمَّا تَرَكۡتُمۡ إِن لَّمۡ يَكُن لَّكُمۡ وَلَدٞۚ فَإِن كَانَ لَكُمۡ وَلَدٞ فَلَهُنَّ ٱلثُّمُنُ مِمَّا تَرَكۡتُمۚ مِّنۢ بَعۡدِ وَصِيَّةٖ تُوصُونَ بِهَآ أَوۡ دَيۡنٖۗ وَإِن كَانَ رَجُلٞ يُورَثُ كَلَٰلَةً أَوِ ٱمۡرَأَةٞ وَلَهُۥٓ أَخٌ أَوۡ أُخۡتٞ فَلِكُلِّ وَٰحِدٖ مِّنۡهُمَا ٱلسُّدُسُۚ فَإِن

كَانُوٓاْ أَكۡثَرَ مِن ذَٰلِكَ فَهُمۡ شُرَكَآءُ فِي ٱلثُّلُثِۚ مِنۢ بَعۡدِ وَصِيَّةٖ يُوصَىٰ بِهَآ أَوۡ دَيۡنٍ غَيۡرَ مُضَآرّٖۚ وَصِيَّةٗ مِّنَ ٱللَّهِۗ وَٱللَّهُ عَلِيمٌ حَلِيمٞ ﴿١٢﴾

## میراتی ژن و مێرد

خودای گەورە ئەفەرموێت: ﴿وَلَكُمۡ نِصۡفُ مَا تَرَكَ أَزۡوَٰجُكُمۡ إِن لَّمۡ يَكُن لَّهُنَّ وَلَدٞۚ فَإِن كَانَ لَهُنَّ وَلَدٞ فَلَكُمُ ٱلرُّبُعُ مِمَّا تَرَكۡنَۚ مِنۢ بَعۡدِ وَصِيَّةٖ يُوصِينَ بِهَآ أَوۡ دَيۡنٖۚ وَلَهُنَّ ٱلرُّبُعُ مِمَّا تَرَكۡتُمۡ إِن لَّمۡ يَكُن لَّكُمۡ وَلَدٞۚ فَإِن كَانَ لَكُمۡ وَلَدٞ فَلَهُنَّ ٱلثُّمُنُ مِمَّا تَرَكۡتُمۚ مِّنۢ بَعۡدِ وَصِيَّةٖ تُوصُونَ بِهَآ أَوۡ دَيۡنٖ﴾ لەو میراتەی لە ژنەکانتان بەجێ دەمێنێ، ئەگەر هیچ منداڵیان نەبوو، لە دوو بەش بەشێکتان هەیە، ئەگەر منداڵیان هەبوو، ئێوە چوار یەکتان پێ دەدرێت. پاش دانەوەی قەرز قۆڵەو وەسیەتێ کە کردویانە. ئەگەر ئێوە مردن و منداڵتان نەبوو، ژنەکانتان چوار یەکی میراتتان دەبەن. ئەگەر منداڵیشتان هەبوو، ژنانتان هەش یەکیان پێ دەبڕێ. پاش پێکهێنانی وەسێتتان و دانەوەی قەرزو قۆڵە. لە پێشەوە باس کرا کە قەرز دانەوە لە پێش وەسیەتەوەیە، پاشان جێ بەجێ کردنی وەسیەتەکە، پاشان دابەش کردنی میراتەکە دێت. ئەمەیش کۆدەنگی لەسەرە لە نێوان زانایاندا، حوکمی منداڵەکانی کوڕیش یا بەرەو خوارتریش بێت هەر حوکمە منداڵانی پشتە(الصُلب) پاشان کە ئەفەرموێت: ﴿وَلَهُنَّ ٱلرُّبُعُ مِمَّا تَرَكۡتُمۡ﴾ هەتا کۆتایەکەی. لە چوار یەک و هەشت یەکا ژنەکان دوان بن یا سیان یا چوار هەریەک هەر شەریکن لەو میراتگریەدا. دوای دانەوەی قەرزو بەجێهێنانی وەسیەت لەو میراتەدا.

## پێناسەی کەلالە

خودای گەورە ئەفەرموێت: ﴿وَإِن كَانَ رَجُلٞ يُورَثُ كَلَٰلَةً﴾ ئەگەر پیاوێ یا ژنێ مردو نە باوان و نە منداڵی لێ بەجێ ما لە میراتگریدا مەبەست بە کەلالە لێرەدا، ئەو کەسانەن کە لە خزمی دورترن و میرات دەبەن، نە ڕەچەڵەکن و نە لە بەشی خوارەوەی مردوەکەن. وەك شەعبی ڕیوایەتی کردوە لە ئەبوبەکری سدیقەوە کە پرسیاری لێ کرا لە بارەی کەلالەوە، وتی: بە بۆچوونی خۆم دەڵێم، ئەگەر پێکام ئەوە لە خواوەیە، ئەگەر هەڵەیش بوو، ئەوە لە شەیتانەوەیە خوداو پێغەمبەرەکەی (ﷺ) پاك و بێ عەیبن و لەوانەوە نیە. کەلالە: ئەو کەسەیە نە منداڵی هەیە و نە باوك. کاتێ عومەر بوو بە خەلیفە وتی: من شەرم دەمگرێ جیاواز بم لە بۆچونێکا ئەبوبەکر ڕای لەسەری بووە[1] ئیبنوجەریرو

[1] الطبري (٨/٥٣).

کەسانی تریش ڕیوایەتیان کردوە. ئیبنوئەبی حاتەم لە تەفسیرەکەیدا ڕیوایەتی کردوە لە ئیبنوعەبباسەوە، وتی: من دواین کەسەکان بووم لە کاتی عومەری کوڕی خەتابدا، گوێم لێی بوو دەیوت: قسەم هەر ئەمەیە کە وتومە، منیش وتم: چیت وتوە؟ وتی: مەبەست بە کەلالە ئەو کەسەیە نە مندالی هەبێو نە باوك.[1] عەلی کوڕی ئەبوتالیبو ئیبنومەسعودو، بە شێوەیەکی تریش لە ئیبنوعەبباسو زەیدی کوڕی سابتو شەعبیو نەخەعیو حەسەنی بەسریو قەتادەو جابیری کوڕی زەیدو حەکەم هەر وایان وتوە.[2] خەلکی مەدینەو کوفەو بەسرەیش هەر وایان وتوە. ئەمە قسەی حەوت زاناکەو (الفُقَهاء السبعة) چوار پێشەواکەو زانایانی پێشینەو پاشینەش هەموویانە، زۆر کەس وتویانە کۆی زانایانی لەسەرە.

## حوکمی مندالی دایك کە لەو باوکە نیە

خودای گەورە ئەفەرموێت: ﴿وَلَهُۥٓ أَخٌ أَوۡ أُخۡتٞ﴾ برایەك یا خوشکێکی بوو. واتە: لە دایکەوە لە خوێندنەوەی هەندێ لە پێشیناندا هاتوە، وەك سەعدی کوڕی ئەبوەقاصو ئەبوبەکری سدیقیش هەر وا تەفسیری کردوە کە قەتادە ڕیوایەتی کردوە لێیەوە: ﴿فَلِكُلِّ وَٰحِدٖ مِّنۡهُمَا ٱلسُّدُسُۚ فَإِن كَانُوٓاْ أَكۡثَرَ مِن ذَٰلِكَ فَهُمۡ شُرَكَآءُ فِي ٱلثُّلُثِۚ﴾ هەر یەك لەوان شەش یەکی میراتەکەی هەیە، ئەگەر لە یەکێك زیاتر بوون، بە هەموویان سێ یەکی میرات دەگات. برای دایکی جیاوازیان هەیە لە میراتگرەکانی تر لە چەند ڕوویەکەوە: یەکەم: لەگەلٚ دایکا میرات ئەبەن. دووەم: نێرو مێیان لە میراتا وەك یەکە. سێهەم: میرات نابەن مەگین مردوەکەیان بە کەلالە میراتی لێ وەرگیرێ. میراتی نابەن لەگەلٚ باوكو باپیرو مندالٚو مندالی مندالٚیش. چوارەم: لە سێ یەکیش زیاتر نابەن، با نێرو مێشیان زیاتریش بێ.

پاشان خودای گەورە ئەفەرموێت: ﴿مِنۢ بَعۡدِ وَصِيَّةٖ يُوصَىٰ بِهَآ أَوۡ دَيۡنٍ غَيۡرَ مُضَآرّٖۚ﴾ پاش پێکهێنانی وەسیەتو دانەوەی قەرز، دەبێ وەسیەت بە شێوەیەك بێ کە بە ئەنقەست بە زیانی میراتگران تەواو نەبێ. واتە: بۆ ئەوەی وەسیێتەکەی دادپەروەرانە بێ، نەك لەسەر زەرەرو ناهەقی خراپە بێتو هەندێ لە میراتگران بێ بەش بکات یان کەمی بداتێ. یان زیاتری لەوە پێبدات کە خودا بۆی داناوە. هەرکاتێ ئەوەی کرد، وەك کەسێ وایە دژایەتی بڕیارو بەشی خودای کردبێ. وە لە فەرموودەی سەحیحا هاتوە کە پێغەمبەری خودا (ﷺ) فەرموویەتی: (بێگومان خودا بەشی هەموو خاوەن هەقێکی داوە هەرکەسەو بەپێی هەقی خۆی، وەسیەت کردن نیە بۆ میرات گر)[3].

---

[1] الطبري (٨/٥٩).

[2] الطبري (٨/٥٥-٥٧).

[3] أبوداود (٢٨٧٠)، التيرميذي (٢١٢٢/٢٢١)، النسائي (٣٦٧)، إبن ماجة (٢٧١٢-٢٧١٣)، فەرموودەیەکی سەحیحە.

﴿ تِلْكَ حُدُودُ اللَّهِ ۚ وَمَن يُطِعِ اللَّهَ وَرَسُولَهُ يُدْخِلْهُ جَنَّاتٍ تَجْرِي مِن تَحْتِهَا الْأَنْهَارُ خَالِدِينَ فِيهَا ۚ وَذَٰلِكَ الْفَوْزُ الْعَظِيمُ ﴿١٣﴾ وَمَن يَعْصِ اللَّهَ وَرَسُولَهُ وَيَتَعَدَّ حُدُودَهُ يُدْخِلْهُ نَارًا خَالِدًا فِيهَا وَلَهُ عَذَابٌ مُّهِينٌ ﴿١٤﴾ ﴾

**هەڕەشەی لە سنوور دەرچوون لە میراتگریدا**

خودای گەورە ئەفەرموێت: ﴿ تِلْكَ حُدُودُ اللَّهِ ﴾ ئەو دەستورانە سنورن خودا دایناوە. ئەو فەرزو بەشانە کە خودا دایناوە بۆ میرات گران خودا دایناوە بەپێی نزیکی میرات بەرەکان لە مردوەکەوە، هەرکەسەو بەپێی پێویستیان بەو میراتە، خودا خۆی دایناوەو لێی لامەدەن‌و سنوری خودا مەبەزێنن هەر بۆیە ئەفەرموێت: ﴿وَمَن يُطِعِ اللَّهَ وَرَسُولَهُ﴾ هەرکەسێك بە فەرمانی خوداو پێغەمبەرەکەی بکات. لە دابەش کردنی میراتدا، زیادو کەمی نەکات لەناو میرات گرەکاندا بە گزی‌و فێڵ‌و فرو وازیان لێ بێنی‌و بڕیاری خودا چۆنە وابکات‌و بیسپێرێ بە خوا ڕازی بێ بەو بەشەی خوا داینـــــاوە ﴿يُدْخِلْهُ جَنَّاتٍ تَجْرِي مِن تَحْتِهَا الْأَنْهَارُ خَالِدِينَ فِيهَا ۚ وَذَٰلِكَ الْفَوْزُ الْعَظِيمُ ﴿١٣﴾ وَمَن يَعْصِ اللَّهَ وَرَسُولَهُ وَيَتَعَدَّ حُدُودَهُ يُدْخِلْهُ نَارًا خَالِدًا فِيهَا وَلَهُ عَذَابٌ مُّهِينٌ ﴾ دەینێرێتە ناو باغاتێك جۆباریان بەبەردا دەڕواو هەتا سەر هەر تیا دەبن‌و لەوپەڕی بەختەوەریدان. هەرکەسێکیش لە فەرمانی خوداو پێغەمبەرەکەی دەرچێ‌و سنووری خودا بە هیچ بگرێ، دەیخاتە ناو ئاگرەوەو هەتا سەر هەر لەوێ دەبێ‌و بەوپەڕی سوکایەتیەوە ئازار ئەدرێت. لەبەر ئەوەی کە بە فەرمانی خودا ڕازی نەبوەو دژایەتی فەرمانی کردوە. ئەمەیش ئەوە دەگەیەنێ کە ئەو کەسە بەو بەشەو بڕیارەی خودا ڕازی نەبوە. بۆیە خودایش سزای ئەداو سووکایەتی پێدەکات لەناو ئاگرا. ئیمامی ئەحمەد ڕیوایەتی کردوە لە ئەبوهورەیرەوە وتی: پێغەمبەری خودا (ﷺ) فەرموویەتی: (بێگومان پیاوی وا هەیە کار دەکات بە کاری خەڵکی چاك حەفتا ساڵ، بەڵام کاتێ کە وەسیەت ئەکات. ناهەقی دەکات لە وەسیەتەکەیا، بە خراپترین کرداری بۆی مۆر دەکرێت‌و دەچێتە ناو ئاگر، پیاوی وایش هەیە، کار دەکات بە کاری خەڵکی خراپ حەفتا ساڵ، دادپەروەری دەکات لە وەسیەتەکەیا، بە چاکترین کرداری بۆ مۆر دەکرێت‌و دەچێتە بەهەشت) وتی: پاشان ئەبوهورەیرە دەڵێت: ئەگەر ویستتان ئەم ئایەتانە بخوێنن کە خودای گەورە ئەفەرموێت: ﴿ تِلْكَ حُدُودُ اللَّهِ ﴾ هەتا دەگاتە ﴿عَذَابٌ مُّهِينٌ ﴾ ئەبوداوود ڕیوایەتی کردوە لە سوننەکەیدا (لە بەشی زیان گەیاندن لە وەسیەتدا) لە ئەبوهورەیرەوە کە پێغەمبەری خودا (ﷺ) فەرموویەتی: (پیاو یا ژنی وا

هەیە کار بە گوێڕایەڵی خوا دەکات شەست ساڵ، پاشان مردن یەخەی دەگرێت، زیان دەگەیەنن لە وەسیەتەکەیا، ئاگر بۆ خۆیان دابین دەکەن) پاشان وتی: شەهری کوڕی حەوشەب وتی: ئەبوهورەیرە بۆی خوێندم لێرەوە کە خودای گەورە ئەفەرموێت: ﴿مِنۢ بَعۡدِ وَصِيَّةٖ يُوصَىٰ بِهَآ أَوۡ دَيۡنٍ غَيۡرَ مُضَآرّٖ﴾ هەتا گەیشتە: ﴿وَذَٰلِكَ ٱلۡفَوۡزُ ٱلۡعَظِيمُ﴾ تیرمیزیو ئیبنوماجەیش هەر ڕوایەتیان کردوە. تیرمیزی وتی: فەرموودەیەکی حەسەنی غەریبە. بەڵام دەقەکەی ئیمامی ئەحمەد تەواو چاکترە.

﴿وَٱلَّٰتِي يَأۡتِينَ ٱلۡفَٰحِشَةَ مِن نِّسَآئِكُمۡ فَٱسۡتَشۡهِدُواْ عَلَيۡهِنَّ أَرۡبَعَةٗ مِّنكُمۡۖ فَإِن شَهِدُواْ فَأَمۡسِكُوهُنَّ فِي ٱلۡبُيُوتِ حَتَّىٰ يَتَوَفَّىٰهُنَّ ٱلۡمَوۡتُ أَوۡ يَجۡعَلَ ٱللَّهُ لَهُنَّ سَبِيلٗا ﴿١٥﴾ وَٱلَّذَانِ يَأۡتِيَٰنِهَا مِنكُمۡ فَـَٔاذُوهُمَاۖ فَإِن تَابَا وَأَصۡلَحَا فَأَعۡرِضُواْ عَنۡهُمَآۗ إِنَّ ٱللَّهَ كَانَ تَوَّابٗا رَّحِيمًا ﴿١٦﴾﴾

**فەرماندان بە بەندکردنی ژنی داوێن پیس نەسخ بونەوەی ئەم فەرمانە لە دوایدا**

لە سەرەتای هاتنی ئیسلامدا بڕیار وا بوو ئەگەر ژنێ داوێن پیسی بکردایە، بە بەڵگەیەکی ڕاستو دروست ئەو داوێن پیسیە بچەسپایەو دەرکەوتایە لە ماڵدا بەند دەکرا، بە هیچ شێوەیەك بۆی نەبوو لەو ماڵە بێتە دەر هەتا ئەمرد. هەر بۆیە خودای گەورە ئەفەرموێت: ﴿وَٱلَّٰتِي يَأۡتِينَ ٱلۡفَٰحِشَةَ مِن نِّسَآئِكُمۡ فَٱسۡتَشۡهِدُواْ عَلَيۡهِنَّ أَرۡبَعَةٗ مِّنكُمۡۖ فَإِن شَهِدُواْ فَأَمۡسِكُوهُنَّ فِي ٱلۡبُيُوتِ حَتَّىٰ يَتَوَفَّىٰهُنَّ ٱلۡمَوۡتُ أَوۡ يَجۡعَلَ ٱللَّهُ لَهُنَّ سَبِيلٗا﴾ ئەوانەی کە کاری داوێن پیسی دەکەن لە ژنەکانتان، چوار کەسی خاوەن باوەڕیان بەرنە سەر (لەو کاتەدا کە لێك جووت بوون) وەختێ ئەوان هاتن شایەتیان لەسەر دان، هەر لە ماڵدا بەندیان بکەن هەتا بە مردن لەناودەچن یان خودا دەروتانیان لێ دەکاتەوە، ئەو ڕێگەیەش کە خودا داینا، نەسخ کردنەوەی ئەوە بوو. ئیبنوعەبباس (ڕەزای خوای لێ بێ) وتی: بڕیارەکە هەر وا مایەوە هەتا خودای گەورە سورەتی نوری ناردە خوارەوە، کە بە قامچی لێدان یان بە بەردەباران نەسخی کردەوە. هەر بەم شێوەیە ڕیوایەت کراوە لە عیکرمەو سەعیدی کوڕی جوبەیرو حەسەنو عەتای خۆراسانیو ئەبوسالحو قەتادەو زەیدی ئەسلەمو زەحاکەوە کە نەسخ بوەتەوە بڕیارێکەو زانایان هاودەنگن لەسەری. ئیمامی ئەحمەد ڕیوایەتی کردوە لە عوبادەی کوڕی سامیتەوە، وتی: پێغەمبەری خودا (ﷺ) کاتێ کە نیگای بۆ بهاتایە، پێوە دیار بوو، بەو نیگایە نارەحەت دەبوو، ڕەنگی دەگۆڕا، ڕۆژێ خودای گەورە نیگای بۆ ڕەوانە کرد، کە نیگاکەی لەسەر نەما فەرمووی: (لێمەوە فێر بنو وەری گرن خودا دەروی لە ئافرەتان کردەوە. ژن بە پیاو کوڕ بە کچ واتە: کە داوێن پیسیان

کرد (ژن‌و پیاو سەد قامچی‌و بەردەباران کردن‌و کوڕو کچیش سەد قامچی‌و دوورخستنەوەی ساڵێك).[1] موسلیم‌و زانایانی تری فەرموودە ڕیوایەتیان کردوە لە عوبادەی کوڕی سامیتەوە لە پێغەمبەرەوە (ﷺ) کە فەرموویەتی: (لێم وەرگرن لێم وەرگرن بەڕاستی خودای گەورە دەرویی لە ژنان کردەوە. کوڕو کچ کە داوێن پیسیان کرد سەد قامچیان لێ ئەدرێ‌و ساڵێك دوور دەخرێنەوە. ژن‌و پیاو کە داوێن پیسیان کرد سەد قامچیان لێ ئەدرێ‌و بەردەبارانیش دەکرێن)[2] تیرمیزی وتی: ئەم فەرموودە حەسەنی سەحیحە. خودای گەورە ئەفەرموێت: ﴿وَٱلَّذَانِ يَأۡتِيَـٰنِهَا مِنكُمۡ فَـَٔاذُوهُمَا﴾ ئەو جووتەی لە ئێوە کە ئەو کارە دەکەن ئازاریان دەن. واتە: ئەو دوانەی کە داوێن پیسی دەکەن ئازاریان دەن. ئیبنوعەبباس‌و سەعیدی کوڕی جوبەیرو کەسانی تریش وتیان: واتە: بە قسە پێوتن‌و تانە لێدان‌و سەرزەنش کردن‌و بە لێدانی نەعل، لێیان ئەدرێ.[3] ئەم بڕیارە بەو شێوەیە مایەوە هەتا ئەو کاتەی کە خودای گەورە بە قامچی‌و بەردە باران نەسخی کردەوە. موجاهید وتی، ئەم ئایەتە هاتە خوارەوە لەسەر ئەو دوو کەسەی کە نێربازیان کردوە والله أعلم. زانایانی فەرموودە، ڕیوایەتیان کردوە لە ئیبنوعەبباسەوە، وتی: پێغەمبەری خودا (ﷺ) فەرموویەتی: (کەسێکتان بینی هەڵدەسێ بە کاری مۆزی لووت ئەوەی کردویەتی‌و ئەوەیش پێی کراوە بکوژن)[4] ﴿فَإِن تَابَا وَأَصۡلَحَا﴾ ئەگەر پەشیمان بونەوەو دەستیان هەلگرت ڕێی چاکەیان گرتە بەر. ﴿فَأَعۡرِضُواْ عَنۡهُمَآ﴾ ئێوە دەستیان لێ هەلگرن. واتە: بە قسەی ناشیرین مامەڵەیان لەگەلا مەکەن دوای ئەوە. چونکە ئەوەی تەوبەی کرد وەك ئەو کەسە وایە تاوانی نەکردبێ. ﴿إِنَّ ٱللَّهَ كَانَ تَوَّابٗا رَّحِيمًا﴾ خودا لە پەشیمانان دەبورێ‌و دلۆڤانە. وە لە هەردوو سەحیحەکەدا هاتوە: (ئەگەر کەنیزەکی یەکێتان داوێن پیسی کرد با قامچی لێ بدات لۆمە ناکرێ)[5] واتە: دوای ئەوە قسەی خراپی پێ نالێ لەسەر ئەوەی کە کردوویەتی. دوای ئەو قامچیەی لێی دراوە کە کەفارەتی ئەو کارەیە کە کردویەتی.

---

[1] أحمد (٣١٧/٥)، فەرموودەیەکی سەحیحە.

[2] مسلم (١٣١٦/٣)، أبوداود (٥٧٠/٤)، تحفة الاحوذي (٧٠٥/٤)، النسائي في الكبرى (٢٧٠/٤)، إبن ماجة (٨٥٢/٢).

[3] الطبري (٨٥/٨).

[4] أبوداود (٦٠٧/٤)، تحفة الاحوذي (٢١/٥)، النسائي في الكبرى (٣٢٢/٤)، إبن ماجة (٨٥٦/٢)، لە حەسەن دەچێ.

[5] فتح الباري (٤٩١/٤)، مسلم (١٣٣٨/٣).

﴿إِنَّمَا ٱلتَّوْبَةُ عَلَى ٱللَّهِ لِلَّذِينَ يَعْمَلُونَ ٱلسُّوٓءَ بِجَهَٰلَةٍ ثُمَّ يَتُوبُونَ مِن قَرِيبٍ فَأُوْلَٰٓئِكَ يَتُوبُ ٱللَّهُ عَلَيْهِمْۗ وَكَانَ ٱللَّهُ عَلِيمًا حَكِيمًا ﴿١٧﴾ وَلَيْسَتِ ٱلتَّوْبَةُ لِلَّذِينَ يَعْمَلُونَ ٱلسَّيِّـَٔاتِ حَتَّىٰٓ إِذَا حَضَرَ أَحَدَهُمُ ٱلْمَوْتُ قَالَ إِنِّي تُبْتُ ٱلْـَٰٔنَ وَلَا ٱلَّذِينَ يَمُوتُونَ وَهُمْ كُفَّارٌۚ أُوْلَٰٓئِكَ أَعْتَدْنَا لَهُمْ عَذَابًا أَلِيمًا ﴿١٨﴾﴾

**وەرگرتنی تەوبەی عەبد هەتا نەگاتە گیانەلاَ**

خـودای گـەورە ئەفـەرموێت: ﴿إِنَّمَا ٱلتَّوْبَةُ عَلَى ٱللَّهِ لِلَّذِينَ يَعْمَلُونَ ٱلسُّوٓءَ بِجَهَٰلَةٍ ثُمَّ يَتُوبُونَ مِن قَرِيبٍ﴾ خودا تۆبە هەر لەوانە قبووڵ دەكات كە لە ڕووی نەزانینـەوە خراپـەیان لـێ ڕوو ئـەداو گورج پەشیمان دەبنەوە. با لە پێش بینینی ئەو فریشتەوە بێ كە گیانی دەكێشێ. واتە: لە پـێش گیانـەلاَوە موجاهیدو كەسانی تریش وتویانە: هەركەسێ سەرپێچی خودای كردبێ بە هەڵە یا بـە ئەنقەست ئـەوە نەزانە، هەتا واز لەو گوناهە دێنێ[1] قەتادە وتی لە ئەبولعالیەوە گێڕاویەتەوە كە هاوەڵـەكانی پێغەمبـەر (ﷺ) دەیان وت: هەر گوناهێ تووشی عەبد دەبێت لـە نەزانینەوەیـە[2] ئیبنوجەریر ڕیوایـەتی كـردوە. عەبدوڕەزاق وتی: موعەمەر هەواڵی دایـنێ لـە قـەتادەوە، وتـی: هاوەڵـەكانی پێغەمبـەری خـودا (ﷺ) كۆبونەوەو هاتنە سـەر ئـەوە كـە هـەر سەرپێچیەك بكرێ لـە نەزانیەوەیـە بـە ئەنقەسـت بـێ یـان بـە ئەنقەست نەبێ[3] ئیبنوجورەیج، وتی: عەبدوڵلای كـوڕی كەسـیر هـەواڵی دامـێ لـە موجاهیـدەوە، وتـی: هەركەسێ هەڵسێ بە سەرپێچی خودای گەورە، لـەو كاتـەدا كـە دەیكـات نەزانـە، ئیبنوجـورەیج وتـی: عەتای كوڕی ڕیحابیش هەر وای وتوە[4] ئەبوسالح وتی لە ئیبنوعەبباسـەوە، لـە نەزانیـەتی كـاری خـراپ كردن[5] عەلی كوڕی ئەبوتەلحە وتـی لـە ئیبنوعەبباسـەوە: ﴿ثُمَّ يَتُوبُونَ مِن قَرِيبٍ﴾ پاشـان زوو تەوبـە دەكەن. وتی: ئەو نێوانەیە كە چاوەڕوانی هاتنی فریشتەی گیان كێشان دەكات[6] زەحاك وتـی: هەرچـی بێت جگە لە مـردن ئـەوە نزیكـە[7]. حەسـەنی بەسـری وتـی: ﴿ثُمَّ يَتُوبُونَ مِن قَرِيبٍ﴾ هـەتا نەكەوێتـە گیانەلاَ.[8] عیكرمە وتی: دنیا هەمووی نزیكە[1] ئیمامی ئەحمـەد ڕیوایـەتی كـردوە لـە ئیبنوعومـەرەوە لـە

---

[1] الطبري (٨/٨٩).

[2] الطبري (٨/٨٩).

[3] عبدالرزاق (١/١٥١).

[4] الطبري (٨/٩٠).

[5] الطبري (٨/٩٠).

[6] الطبري (٨/٩٤).

[7] الطبري (٨/٩٤).

[8] الطبري (٨/٩٦).

پێغەمبەرەوە (ﷺ) فەرموویەتی: (بێگومان خودا تەوبەی بەندەی قبولّ دەكات هەتا نەگاتە گیانەلاّ)[2] تیرمیزیو ئیبنوماجەیش ڕیوایەتیان كردوە. تیرمیزی وتی: فەرموودەیەكی حەسەنی غەریبە. وە لە سونەنی ئیبنوماجەدا هاتوە لە عەبدوڵلای كوڕی عومەرەوە، ئەمە گومانە، بەڵكو عەبدوڵلای كوڕی عومەری كوڕی خەتابە[3] خودای گەورە ئەفەرموێت: ﴿فَأُولَٰٓئِكَ يَتُوبُ ٱللَّهُ عَلَيۡهِمۡۗ وَكَانَ ٱللَّهُ عَلِيمًا حَكِيمًا﴾ ئەوانە خودا تۆبەیان وەردەگریو خودا زانای لەكارزانە. بەڵام كاتێ كە بێ هیوایی پەیدا دەبێ لە ژیانو فریشتەی گیان كێشان دێتو دەگاتە قوڕقوڕاگەو هەناسە لە سنگ تەنگ دەبێو گیان دەكەوێتە گیانەلاو بەرەو دەرچوون دەڕوات، ئیتر لەوێدا تەوبە قبولّ ناكرێو هیچ مۆڵەتێ نامێنێ. لەبەر ئەوەیە كە خودای گەورە ئەفەرموێت: ﴿وَلَيۡسَتِ ٱلتَّوۡبَةُ لِلَّذِينَ يَعۡمَلُونَ ٱلسَّيِّـَٔاتِ حَتَّىٰٓ إِذَا حَضَرَ أَحَدَهُمُ ٱلۡمَوۡتُ قَالَ إِنِّي تُبۡتُ ٱلۡـَٰٔنَ﴾ ئیتر پەشیمان بونەوەی ئەوانە هیچ سودێكی نیە كە لە وەختی گیانەلاّدا دەڵێن: ئێمە پەشیمانین. وەك چۆن بڕیاری داوە كاتێ كە خۆر لە خۆرئاواوە هەڵهاتو بینرا ئیتر تەوبەی خەڵكی سەر زەمین قبوولّ ناكرێ. وەك خودای گەورە ئەفەرموێت: ﴿يَوۡمَ يَأۡتِي بَعۡضُ ءَايَٰتِ رَبِّكَ لَا يَنفَعُ نَفۡسًا إِيمَٰنُهَا لَمۡ تَكُنۡ ءَامَنَتۡ مِن قَبۡلُ أَوۡ كَسَبَتۡ فِيٓ إِيمَٰنِهَا خَيۡرًا﴾[4] ئەو ڕۆژە كە ئەم جۆرە نیشانانە بێتە لایان. هەركەسێ لە پێشا بڕوای نەهێنابێو تاكاری چاكی نەبوبێ، بڕوا هێنان تازە بەهرەیان بۆ نادات، وە لێرەدا ئەفەرموێت: ﴿وَلَا ٱلَّذِينَ يَمُوتُونَ وَهُمۡ كُفَّارٌۚ﴾ پەشیمانی ئەوانەش قبوولّ نیە كە بە خوانەناسی دەمرن. واتە: كاتێ كە خوانەناس لەسەر ئەو خوانەناسیو بت پەرستیە مرد، پەشیمان بونەوەو تەوبە كردن سوودی پێ ناگەیەنێ بە ئەندازەی پڕ بە زەمین فیدیە بدات هەر لێی وەرناگیرێ. ئیبنوعەبباسو ئەبولعالیەو ڕەبیعی كوڕی ئەنەس لەمەدا كە خودای گەورە ئەفەرموێت: ﴿وَلَا ٱلَّذِينَ يَمُوتُونَ وَهُمۡ كُفَّارٌۚ﴾ وتویانە: لەسەر خەڵكی بت پەرست هاتۆتە خوارەوە. ئیمامی ئەحمەد ڕیوایەتی كردوە لە ئوسامەی كوڕی سولەیمانەوە كە ئەبوزەڕ بۆی باس كردوون پێغەمبەری خودا (ﷺ) فەرموویەتی: (بێگومان خودا تۆبەی عەبدی خۆی قبوولّ دەكات، یان لێی خۆش دەبێ هەتا پەردە دانەنرێ) وتیان: دانانی حیجاب چیە؟ فەرمووی: (ئەو گیانە بە موشریكی

---

[1] الطبري (٩٤/٨).

[2] أحمد (١٣٢/٢)، حەسەنە.

[3] تحفة الاحوذي (٥٢١/٩)، إبن ماجة (١٤٢٠/٢)، حەسەنە.

[4] الانعام (١٥٨).

دەڕیچێت)[1]. هەر بۆیە خودای گەورە ئەفەرموێت: ﴿أُولَٰئِكَ أَعْتَدْنَا لَهُمْ عَذَابًا أَلِيمًا﴾ ئێمە بۆ ئەوانە ئازارێکی زۆر بە ژانمان ئامادەکردوە.

﴿يَا أَيُّهَا الَّذِينَ آمَنُوا لَا يَحِلُّ لَكُمْ أَن تَرِثُوا النِّسَاءَ كَرْهًا ۖ وَلَا تَعْضُلُوهُنَّ لِتَذْهَبُوا بِبَعْضِ مَا آتَيْتُمُوهُنَّ إِلَّا أَن يَأْتِينَ بِفَاحِشَةٍ مُّبَيِّنَةٍ ۚ وَعَاشِرُوهُنَّ بِالْمَعْرُوفِ ۚ فَإِن كَرِهْتُمُوهُنَّ فَعَسَىٰ أَن تَكْرَهُوا شَيْئًا وَيَجْعَلَ اللَّهُ فِيهِ خَيْرًا كَثِيرًا ﴿١٩﴾ وَإِنْ أَرَدتُّمُ اسْتِبْدَالَ زَوْجٍ مَّكَانَ زَوْجٍ وَآتَيْتُمْ إِحْدَاهُنَّ قِنطَارًا فَلَا تَأْخُذُوا مِنْهُ شَيْئًا ۚ أَتَأْخُذُونَهُ بُهْتَانًا وَإِثْمًا مُّبِينًا ﴿٢٠﴾ وَكَيْفَ تَأْخُذُونَهُ وَقَدْ أَفْضَىٰ بَعْضُكُمْ إِلَىٰ بَعْضٍ وَأَخَذْنَ مِنكُم مِّيثَاقًا غَلِيظًا ﴿٢١﴾ وَلَا تَنكِحُوا مَا نَكَحَ آبَاؤُكُم مِّنَ النِّسَاءِ إِلَّا مَا قَدْ سَلَفَ ۚ إِنَّهُ كَانَ فَاحِشَةً وَمَقْتًا وَسَاءَ سَبِيلًا ﴿٢٢﴾﴾

## مانای بە زۆرداری ژنان کردنە ماڵی میراتی

بوخاری ڕیوایەتی کردوە لە ئیبنوعەبباسەوە لەم ئایەتەدا: ﴿يَا أَيُّهَا الَّذِينَ آمَنُوا لَا يَحِلُّ لَكُمْ أَن تَرِثُوا النِّسَاءَ كَرْهًا﴾ ئەی کۆمەڵی خاوەن باوەڕان، بۆتان ڕەوا نیە ژنان بە زۆرداری بکەنە ماڵی میراتی. وتی: ئەگەر پیاوێ بمردایە، کەس و کاری پیاوەکە خۆیان دەکردە خاوەنی ژنەکەی، ئەگەر هەندێکیان بیانویستایە مارەیان دەکرد یان ئەیاندا بە شوو ئەگەر بشیان ویستایە دەیانهێشتەوەو نەیان ئەدا بە شوو، خۆیان بە شایستەتر دادەنا لە کەس و کاری ژنەکە خۆی. خودای گەورە ئەم ئایەتەی ناردە خوارەوە لەو بارەیەوە: ﴿يَا أَيُّهَا الَّذِينَ آمَنُوا لَا يَحِلُّ لَكُمْ أَن تَرِثُوا النِّسَاءَ كَرْهًا﴾[2].

## ڕێگری لە زیان گەیاندن بە ژنان

خودای گەورە ئەفەرموێت: ﴿وَلَا تَعْضُلُوهُنَّ لِتَذْهَبُوا بِبَعْضِ مَا آتَيْتُمُوهُنَّ﴾ نابێ زۆریشیان بۆ بێنن هەندێ لەوەی پێتان داون دیسان لێیان بسێننەوە. واتە: بە خراپە هەڵسوکەوتیان لەگەڵ مەکەن، بۆ ئەوەی، ئەوەی پێتان داوە لە مارەیی یا هەندێکی یان هەقێ لە هەقەکانیان هەیانە بەسەرتانەوە دەست لێ هەڵگرن و وازی لێ بێنن بۆتان. یا هەرشتێ لەوانە وەك تۆڵە لێ سەندنێك و چەوساندنەوەیەك. پاشان خودای گەورە ئەفەرموێت: ﴿إِلَّا أَن يَأْتِينَ بِفَاحِشَةٍ مُّبَيِّنَةٍ﴾ جا مەگین هەر بە ئاشکرا کاری داوێن پیسی بکەن. ئیبنومەسعودو ئیبنوعەبباس و سەعیدی کوڕی موسەیب و

---

[1] أحمد (١٧٤/٥)، فەرموودەیەکی بەهێز نی یە.

[2] فتح الباري (٩٣/٨).

حەسەنی بەسری و موحەممەدی کوڕی سیرین و سەعیدی کوڕی جوبەیرو شەعبی و موجاهیدو عیکرمەو عەتای خۆراسانی و زەحاك و ئەبوقەلابەو ئەبوسالح و سوودی و زەیدی کوڕی ئەسلەم و سەعیدی کوڕی ئەبوهیلال وتویانە: مەبەست پێی داوێن پیسیە. واتە: کاتێ داوێن پیسی کرد، بۆت هەیە ئەو مارەییەی کە پێت داوە لێی وەرگریتەوەو هەراسانی بکەی هەتا واز لەو مارەییە دێنێ بۆت و دەستی لێ هەڵدەگرێ[1] وەك خودای گەورە لە سورەتی بەقەرەدا فەرموویەتی: ﴿وَلَا يَحِلُّ لَكُمْ أَن تَأْخُذُوا مِمَّا آتَيْتُمُوهُنَّ شَيْئًا إِلَّا أَن يَخَافَا أَلَّا يُقِيمَا حُدُودَ اللَّهِ﴾[2] لەوماڵەی کە پێتان داوون ڕەوا نیە هیچیان لێ وەرگرنەوە، مەگین ترسیان لەوە هەبێ کە نەتوانن سنوری فەرمانی خودا بپارێزن. ئیبنوعەبباس و عیکرمەو زەحاك وتیان: داوێن پیسی ئاشکراو بێ گوێی سەرپێچی کردن.[3] ئیبنوجەریر وتی: ئەمانە هەموو دەگرێتەوە: داوێن پیسی و سەرپێچی و قسەی ناشیرین و بێ گوێی هەر شتێك لەمانە. واتە: ئەم کارانەی ڕێی ئەدات کە ئەو ژنە هەراسان بکات و زۆری پێ بێنن هەتا واز لە هەقی خۆی بێنێ یان لە هەندێکی و لێی جیا بێتەوە ئەمە شتێکی چاکە والله أعلم.

**فەرماندان بە چاك جوڵانەوە لەگەڵ ژنان**

خودای گەورە ئەفەرموێت: ﴿وَعَاشِرُوهُنَّ بِالْمَعْرُوفِ﴾ بە شێوەیەکی جوان و ڕەوا، لەگەڵیان بجوڵێنەوە واتە: قسەتان خۆش بێ لەگەڵیان و کردارو شێوەو ڕوخسارتان چاك کەن وەك چۆن لەوانتان دەوێ و تۆش وەك ئەوان بکە. وەك خودای گەورە ئەفەرموێت: ﴿وَلَهُنَّ مِثْلُ الَّذِي عَلَيْهِنَّ بِالْمَعْرُوفِ﴾[4] هەر وەك ئەرکی ژنانیان لەسەر شانە، ژنەکانیش مافی ڕەوای خۆیان هەیە. پێغەمبەری خودا (ﷺ) فەرموویەتی: (چاکترینتان، چاکترینتانە بۆ خێزانی، وە من چاکترینتانم بۆ خێزانم).[5] لە ڕەوشتی پێغەمبەر (ﷺ) هەڵسوکەوتی زۆر جوان بووە، هەمیشە خۆش ڕوو بووە، قسەی خۆشی لەگەڵ خێزانەکانی کردوەو بەسۆز بووە بۆیان، دەست کراوە بووە لە بژێوی دنیادا، لەگەڵ خێزانەکانیا دەم بە خەندە بووە، هەتا ئەوە بوو پێش پێشێنی لەگەڵ دایکی خاوەن باوەڕاندا عائیشەدا دەکرد(ڕەزای خوای لێ بێ) لەگەڵیا دەرۆشت بۆ ئەوە. عائیشە وتی: پێغەمبەری خودا (ﷺ) پێشی ئەدامەوە منیش پێشم ئەدایەوە، ئەوە لە پێش ئەوەدا بوو کە گۆشت هەڵگرم. پاشانیش پێشبڕکێم لەگەڵا کرد دوای

---

[1] الطبري (٨/١١٥-١١٧).

[2] البقرة (٢٢٩).

[3] الطبري (٨/١١٧).

[4] البقرة (٢٢٨).

[5] تحفة الاحوذي (١٠/٣٩٤)، فەرموودەیەکی سەحیحە.

ئەوە کە گۆشتم هەڵگرت، پێشم کەوتو فەرمووی: (ئەمە بە ئەوە)[1]، واتە: ئەم پێش کەوتنەم بەوەی تۆ کە پێشم کەوتی، هەموو شەوێك خێزانەکانی لەوماڵەی کە تێدا دەمایەوە کۆ دەکردەوە هەندێ کات خواردنی ئێوارەشی لەگەڵ دەخواردن، پاشان هەریەکەیان دەڕۆشتەوە بۆ شوێنی خۆی. لەگەڵ ئەو ژنەی خێزانی لە یەك شوێنا دەخەوت و باڵاپۆشەکەی لەسەر شانی لادەبردو بە ڕانکەوە (إلا زار) دەخەوت. کە نوێژی عیشای دەکرد دەچووە شوێنی خۆی، کەمێ قسەی خۆشی لەگەڵ خێزانی دەکرد پێش ئەوەی بخەوێ و بەوە دڵخۆشی دەکرد. وەك خودای گەورە ئەفەرموێت: ﴿لَّقَدْ كَانَ لَكُمْ فِي رَسُولِ ٱللَّهِ أُسْوَةٌ حَسَنَةٌ﴾[2] بێگومان پێغەمبەری خودا (ﷺ) سەرمەشقی چاکە بۆ ئێوە. پاشان خودای گەورە لێرەدا ئەفەرموێت: ﴿فَإِن كَرِهْتُمُوهُنَّ فَعَسَىٰٓ أَن تَكْرَهُوا۟ شَيْـًٔا وَيَجْعَلَ ٱللَّهُ فِيهِ خَيْرًا كَثِيرًا﴾ ئەگەر خۆشتان نەهات لێیان، شتی وا هەن ئێوە حەزی لێ نەکەن و چاکەی زۆری لە خوداوە بۆ ئێوە تێدایە. واتە: هێشتنەوەیان و خۆڕاگریتان لەگەڵ ئەو حەز لێ نەکردنەیان، لەوانەیە خێری دنیاو قیامەتی تێدا بێ بۆتان. وەك ئیبنوعەبباس لەم ئایەتەدا وتی: لەوانەیە خودا منداڵێکی چاکیان پێ ببەخشێ، بە بوونی ئەو منداڵە خێرێکی زۆر برژێ بەسەریاندا. وە لە فەرموودەی سەحیحا هاتووە: (با هیچ پیاوێکی خاوەن باوەڕ ڕق و کینە هەڵنەگرێ لە هاوسەرە خاوەن باوەڕەکەی، چونکە ئەگەر ڕەوشتێکی ئەوی بە دڵ نەبێ، شتێکی تری هەر بە دڵ دەبێت)[3].

### ڕێگری لە سەندنەوەی مارەیی

خودای گەورە ئەفەرموێت: ﴿وَإِنْ أَرَدتُّمُ ٱسْتِبْدَالَ زَوْجٍ مَّكَانَ زَوْجٍ وَءَاتَيْتُمْ إِحْدَىٰهُنَّ قِنطَارًا فَلَا تَأْخُذُوا۟ مِنْهُ شَيْـًٔا ۚ أَتَأْخُذُونَهُۥ بُهْتَٰنًا وَإِثْمًا مُّبِينًا﴾ ئەگەر ویستتان ژنی خۆتان بە ژنێکی تر بگۆڕن، ئەگەر بە ژنەکەی پێشوتان کلوورێك(قنطار) پارەتان دابێ، نابێ لێیان بسێننەوە دەتانەوێ بە بوختان و خۆ تووش کردنی گوناهی ئاشکرا بیسێننەوە؟ واتە: هەرکەسێ لە ئێوە ویستی لە ژنەکەی جیابێتەوەو ژنێکی تر بێنێ، بۆی نیە هیچ لەو مارەیەی کە پێی داوە لێی وەرگرێتەوە، با کلورێ ماڵیشی بێ. لە سورەتی ئالی عیمراندا بە درێژی باسی (قنطار)مان کردوە، پێویست ناکات لێرەدا دووبارەی بکەینەوە. ئەم ئایەتە بەڵگەیە لەسەر دروستی مارەیی زۆر. عومەری کوڕی خەتاب ڕێگری کرد لە مارەیی زۆر، بەڵام پاشان پەشیمان بوە لەوە. وەك ئیمامی ئەحمەد ڕیوایەتی کردوە لە

---

[1] أبوداود (٣/٦٦)، سەحیحە.

[2] الاحزاب (٢١).

[3] مسلم (١/١٠٩١).

ئەبوجەعفای سەلەمیەوە، وتی: بیستم لە عومەری کوڕی خەتاب ئەیفەرموو: ئەوسا زۆر زیادەڕەوی مەکەن لە مارەیدا، ئەگەر ڕێزو بەخشینێ بوبێ لە دنیادا یان لە خواترسی بوایە لەلای خودا لەپێش ترین کەستان پێغەمبەر (ﷺ) دەبوو. پێغەمبەری خودا (ﷺ) مارەیی بە هیچ ژنێك لە ژنەکانیو وە هیچ لە کچەکانی زیاتر لە دوانزە ئەوقیە نەبووە. پیاوی وا هەیە تووشی ناڕەحەتی دەبێ بەهۆی مارەیی ژنەکەیەوە، هەتا دەڵێت: ئەوەندە ئەرکی تۆ وا لەسەرمو ناڕەحەتی کردووم وەك (علق القربة)[1] وایە، واتە: ئەوەندە زۆرو قورسە بۆم هەڵناگیرێ، ئیمامی ئەحمەدو زانایانی تری فەرموودەیش ڕیوایەتیان کردوە لە چەند ڕێگاوە[2] تیرمیزی وتی: ئەمە فەرموودەیەکی حەسەنی سەحیحە. حافیز ئەبویەعلا ڕیوایەتی کردوە لە مەسروقەوە، وتی: عومەری کوڕی خەتاب چووە سەر مینبەرەکەی پێغەمبەری خودا (ﷺ) پاشان وتی: ئەی خەڵکینە چیە ئەوەندە مارەیی ژنانتان زۆر کردوە، پێغەمبەری خوداو (ﷺ) هاوەڵەکانی مارەیی لە نێوانیاندا چوار سەد درهەم بوەو لەوە زیاتر نەبوە. ئەگەر زۆری مارەیی لە خوا ترسی بوایە لەلای خودا یان ڕێزلێنان بوایە، پێش ئەوان نەدەکەوتن تێیدا. نەزانراوە هیچ کەسێ لە چوارسەد درهەم زیاتر مارەیی ژنی دابێ. وتی: پاشان هاتە خوارەوە. ژنێکی قورەیشی ناڕەزایی دەربڕی بەرانبەریو وتی: ئەی گەورەی موسوڵمانان ڕێگریت کردوە لە خەڵکی کە مارەیی بدەن بە ژنەکانیان زیاتر لە چوار سەد درهەم، وتی: بەڵێ، ژنەکە وتی: ئایا گوێت لەوە نەبوە کە خودای گەورە فەرموویەتی: ﴿وَءَاتَيۡتُمۡ إِحۡدَىٰهُنَّ قِنطَارٗا﴾ عومەر وتی: ئەی خودایە داوای لێخۆش بوونت لێ دەکەم. هەموو خەڵکی لە عومەر زاناترە. پاشان گەڕایەوەو چووە سەر مینبەرەکەو، وتی: من ئەوسا ڕێگریم لێ کردن لە زیاد کردنی مارەیی ژنان لە چوار سەد درهەم، هەرکەسێ حەز دەکات چەندێ مارەیی بدا لە ماڵی خۆی با بیدات، ئەبویەعلا وتی: وا دەزانم وتی: هەرکەسێ بە ئارەزوی خۆی زیادی دەکات، با زیادی بکات. سەنەدەکانی ئەم فەرموودە چاكو بەهێزە. وە خودای گەورە ئەفەرموێت: ﴿وَكَيۡفَ تَأۡخُذُونَهُۥ وَقَدۡ أَفۡضَىٰ بَعۡضُكُمۡ إِلَىٰ بَعۡضٖ﴾ جا چۆنیان لێ دەسێننەوە، کە ئێوە بەیەکەوە بوونو هەر لە جێو نانێکدا خەوتوون. ئیبنوعەبباسو موجاهیدو سوودیو کەسانی تریش دەڵێن: مەبەست پێی سەرجێیی کردنە[3]، وە لە هەردوو سەحیحەکەدا هاتوە کە پێغەمبەری خودا (ﷺ) فەرموویەتی بەو پیاوو ژنەی کە نەفرینی خودایان لە یەکتری کرد، دوای لێبونەوەیان لەو نەفرین کردنە (خودا دەزانێ کە یەکێکتان درۆزنە. ئایا کێ لە ئێوە تەوبە دەکات؟) سێ جار فەرمووی،

---

[1] أحمد (٤٠/١)، فەرموودەیەکی حەسەنە.

[2] أبوداود (٥٨٢/٢)، حەسەنە.

[3] الطبري (١٢٦/٨).

پیاوەکە وتی: ئەی پێغەمبەری خودا (ﷺ) ئەیماڵەکەم؟ یانی: مارەییەکەی، فەرمووی: (تۆ ماڵت ناکەوێ، ئەگەر ڕاست دەکەی ماڵەکەت بە موقابیلی ئەوەی کە چویتە لای، ئەگەر درۆش بکەی ئەو ماڵە لە تۆ دورترە هەتا ئەو، واتە: هەم چویتە لایو هەم بوختانت بۆ کردوە).[1] هەر بۆیە خودای گەورە ئەفەرموێت: ﴿وَكَيْفَ تَأْخُذُونَهُۥ وَقَدْ أَفْضَىٰ بَعْضُكُمْ إِلَىٰ بَعْضٍ﴾ جا چۆنیان لێ دەسێننەوە، کە ئێوە بەیەکەوە بوونو هەر لە جێو بانێکا خەوتوون، خۆشیتان لە یەکتر دیوە، پاشان ئەفەرموێت: ﴿وَأَخَذْنَ مِنكُم مِّيثَٰقًا غَلِيظًا﴾ ئەوان پەیمانی بتەویان لەگەڵ ئێوەدا بەستوە. ڕیوایەت کراوە لە ئیبنوعەبباسو موجاهیدو سەعیدی کوڕی جوبەیرەوە. مەبەست پێی پەیمانە (العقد).[2] وە لە سەحیحی موسلیما هاتوە لە جابیرەوە، لە حەجی ماڵئاوایدا کە پێغەمبەر (ﷺ) تێیدا فەرموویەتی: (ئامۆژگاری وەرگران چاك بن لەگەڵ ژنان، چونکە ئێوە بە ئەمانی خوا وەرتان گرتوونو بە وتەی خودا سەرجێیی ئەوانتان بۆ حەڵاڵ کراوە)[3].

**قەدەغە کردنی ژنی باوك بۆ کوڕەکانیو حوکمی ئەوانەی سەرپێچی دەکەن**

خودای گەورە ئەفەرموێت: ﴿وَلَا تَنكِحُوا۟ مَا نَكَحَ ءَابَآؤُكُم مِّنَ ٱلنِّسَآءِ إِلَّا مَا قَدْ سَلَفَ ۚ إِنَّهُۥ كَانَ فَٰحِشَةً وَمَقْتًا وَسَآءَ سَبِيلًا﴾ ژنانێك مەخوازن کە باوانی ئێوە مارەیان کردبن. مەگین ئەوەی لە سەردەمی نەفامیدا بووەو ڕۆشتووە. چونکە سەرجێیی ئەمانە بە داوێن پیسی دادەنرێو زۆر شوورەییەو ڕێبازێکی زۆر خراپە. خودای گەورە ژنی باوانی حەرام کردوەو ڕێزی لێ ناونو ڕێگەی نەداوە کە دوای خۆیان کوڕەکانیان ژنەکانیان مارە بکەن، هەتا عەقدەکەشیان لێ حەرام کراوە، ئەمە بڕیارێکەو کۆدەنگی زانایانی لەسەرە. ئیبنوجەریر ڕیوایەتی کردوە لە ئیبنوعەبباسەوە، خەڵکی لە کاتی نەفامیدا ئەوەی خوا حەرامی کرد بوو ئەوانیش حەرامیان کردبوو، جگە لە ژنی باوك (باوەژن)و کۆکردنەوەی دوو خوشك بەیەکەوە. خودای گەورە ئەم ئایەتەی نارده خوارەوە: ﴿لَا تَنكِحُوا۟ مَا نَكَحَ ءَابَآؤُكُم مِّنَ ٱلنِّسَآءِ إِلَّا مَا قَدْ سَلَفَ ۚ إِنَّهُۥ كَانَ فَٰحِشَةً وَمَقْتًا وَسَآءَ سَبِيلًا ﴿٢٢﴾ حُرِّمَتْ عَلَيْكُمْ أُمَّهَٰتُكُمْ وَبَنَاتُكُمْ وَأَخَوَٰتُكُمْ وَعَمَّٰتُكُمْ وَخَٰلَٰتُكُمْ وَبَنَاتُ ٱلْأَخِ وَبَنَاتُ ٱلْأُخْتِ وَأُمَّهَٰتُكُمُ ٱلَّٰتِىٓ أَرْضَعْنَكُمْ وَأَخَوَٰتُكُم مِّنَ ٱلرَّضَٰعَةِ وَأُمَّهَٰتُ نِسَآئِكُمْ وَرَبَٰٓئِبُكُمُ

---

[1] فتح الباري (٩/٢٦٦)، مسلم (٢/١١٣١).

[2] الطبري (٨/١٢٩).

[3] مسلم (٢/٨٨٩).

ٱلَّتِي فِي حُجُورِكُم مِّن نِّسَآئِكُمُ ٱلَّتِي دَخَلْتُم بِهِنَّ فَإِن لَّمْ تَكُونُوا۟ دَخَلْتُم بِهِنَّ فَلَا جُنَاحَ عَلَيْكُمْ وَحَلَٰٓئِلُ أَبْنَآئِكُمُ ٱلَّذِينَ مِنْ أَصْلَٰبِكُمْ وَأَن تَجْمَعُوا۟ بَيْنَ ٱلْأُخْتَيْنِ﴾[1]، دوو خوشكیش پێكەوە هێنان ڕەوا نیە. عەتاو قەتادەیش هەر وایان وتوە.[2] ئەمە قەدەغەیە لەناو ئەم ئوممەتەداو شتێكی زۆر ناشیرینو ناڕەوایە هەر بۆیە خودای گەورە ئەفەرموێت: ﴿إِنَّهُۥ كَانَ فَٰحِشَةً وَمَقْتًا وَسَآءَ سَبِيلًا﴾ ئەمانە بە داوێن پیسی دادەنرێو شورەییەو ڕێبازێكی زۆر خراپە. وە ئەفەرموێت: ﴿وَلَا تَقْرَبُوا۟ ٱلزِّنَىٰٓ إِنَّهُۥ كَانَ فَٰحِشَةً وَسَآءَ سَبِيلًا﴾[3] نزیكی داوێن پیسی مەكەون، داوێن پیسی ئاكاری زۆر نالەبارەو ڕێبازێكی زۆر خراپە. وە ئەفەرموێت: ﴿وَلَا تَقْرَبُوا۟ ٱلْفَوَٰحِشَ مَا ظَهَرَ مِنْهَا وَمَا بَطَنَ﴾[4] بە ئاشكراو بە نهێنی خۆتان تووشی خراپە مەكەن. لێرەدا (مقتاً)ی بۆ زیاد كراوە، یانی زۆر خراپو قێزەون. ئەوەندە ناشیرینە دەبێتە هۆی سووكایەتی كردنی كوڕ بە باوكی كاتێ كە ژنەكەی مارە دەكات، زۆر جار وا ڕێ دەكەوێ كەسێ ژنێ مارە دەكات، ڕقی لەو كەسەیە لە پێش ئەوا مارەی كردوە. هەر بۆیە خودای گەورە دایكانی خاوەن باوەڕانی حەرام كردوە لەسەر ئوممەتەكەی، چونكە خێزانی پێغەمبەرن (ﷺ) وەك باوكیان وایە، بەڵكو هەقی پێغەمبەر (ﷺ) زۆر زۆرترە لە هەقی باوك، بە كۆدەنگی زانایان. بەڵكو خۆشەویستی ئەو زیاترە لە خۆشەویستی گیانی خۆشمان. عەتای كوڕی ئەبوڕیباح وتی لەم وتەدا (مقتاً) وتی: واتە: خودا ڕقی لێی هەڵدەسێ ﴿وَسَآءَ سَبِيلًا﴾ واتە ڕێبازێكی زۆر خراپە هەركەسێ بیگرێتە بەر. هەركەسێ دوای ئەمە بیكات، ئەوە لە ئاینەكەی دەرچوەو دەبێ بكوژرێوماڵەكەیشی دەبێتە دەسكەوتی خەزێنەی دەوڵەتی وەك ئیمامی ئەحمەدو زانایانی تری فەرمووده ڕیوایەتیان كردوە لە چەندین ڕێگاوە لە بەرائی كوڕی عازیبەوە لە خاڵیەوە ئەبوبوردەو (لە ڕیوایەتێكی تر لە ئیبنوعومەرەوە، وە لە ڕیوایەتێكی تردا لە مامیەوە) كە پێغەمبەری خودا (ﷺ) ناردی بۆ لای پیاوێ كە ژنەكەی باوكی خۆی مارە كردبوو لە دوای باوكی. كە بیكوژێو ماڵەكەیشی بكاتە دەستكەوتو بێنێتی[5].

---

[1] النساء (٢٣). الطبري (١٣٢/٨).

[2] الطبري (١٣٢/٨-١٣٤).

[3] الاسراء (٣٢).

[4] الانعام (١٥١).

[5] أحمد (٢٩٠/٤)، أبوداود (٦٠٩/٤)، تحفة الاحوذي (٥٩٨/٤)، النسائي في الكبرى (٢٩٦/٤)، إبن ماجة (٨٩٦/٢)، فەرموودەیەكی بەهێزە.

﴿ حُرِّمَتْ عَلَيْكُمْ أُمَّهَٰتُكُمْ وَبَنَاتُكُمْ وَأَخَوَٰتُكُمْ وَعَمَّٰتُكُمْ وَخَٰلَٰتُكُمْ وَبَنَاتُ ٱلْأَخِ وَبَنَاتُ ٱلْأُخْتِ وَأُمَّهَٰتُكُمُ ٱلَّٰتِىٓ أَرْضَعْنَكُمْ وَأَخَوَٰتُكُم مِّنَ ٱلرَّضَٰعَةِ وَأُمَّهَٰتُ نِسَآئِكُمْ وَرَبَٰٓئِبُكُمُ ٱلَّٰتِى فِى حُجُورِكُم مِّن نِّسَآئِكُمُ ٱلَّٰتِى دَخَلْتُم بِهِنَّ فَإِن لَّمْ تَكُونُوا۟ دَخَلْتُم بِهِنَّ فَلَا جُنَاحَ عَلَيْكُمْ وَحَلَٰٓئِلُ أَبْنَآئِكُمُ ٱلَّذِينَ مِنْ أَصْلَٰبِكُمْ وَأَن تَجْمَعُوا۟ بَيْنَ ٱلْأُخْتَيْنِ إِلَّا مَا قَدْ سَلَفَ ۗ إِنَّ ٱللَّهَ كَانَ غَفُورًا رَّحِيمًا ﴿٢٣﴾ ﴾

**باسی قەدەغەکردنی هەتا هەتایی و ئەوەیش کە هەتا هەتایی نیە**

ئەم ئایەتە پیرۆزە ئایەتی حەرام کردنی ئەو کەسانەیە کە بە خزمایەتی پشت قەدەغەکراون و ئەو کەسانەی بە شیر پێدان و ئەوانەشی بەهۆی بوون بە زاواوە دەبنە خزم، وەك ئیبنوئەبی حاتەم ڕیوایەتی کردوە لە ئیبنوعەبباسەوە، وتی: حەوتتان لێ حەرام کراوە بە نەسەب و حەوتیش بە بوون بە زاوایی و ئەم ئایەتەی خوێند: ﴿ حُرِّمَتْ عَلَيْكُمْ أُمَّهَٰتُكُمْ وَبَنَاتُكُمْ وَأَخَوَٰتُكُمْ وَعَمَّٰتُكُمْ وَخَٰلَٰتُكُمْ وَبَنَاتُ ٱلْأَخِ وَبَنَاتُ ٱلْأُخْتِ ﴾[1] ئەو ژنانەی پێتان ناشێن و حەرام کراون بریتین لە دایك و کچ و خوشك و پوری خوشکی باوك و پوری خوشکی دایك و کچی براو کچی خوشك. تەبەریش ڕیوایەتی کردوە لە ئیبنوعەبباسەوە، وتی: حەوت حەرام کراوە بە نەسەب و حەوتیش بە شیر پێدان و خزمایەتی کردن، پاشان ئەم ئایەتەی خوێند: ﴿ حُرِّمَتْ عَلَيْكُمْ أُمَّهَٰتُكُمْ وَبَنَاتُكُمْ وَأَخَوَٰتُكُمْ وَعَمَّٰتُكُمْ وَخَٰلَٰتُكُمْ وَبَنَاتُ ٱلْأَخِ وَبَنَاتُ ٱلْأُخْتِ ﴾[2] ئەمانە هی پشتن (النسب)، وە خودای گەورە ئەفەرموێت: ﴿وَأُمَّهَٰتُكُمُ ٱلَّٰتِىٓ أَرْضَعْنَكُمْ وَأَخَوَٰتُكُم مِّنَ ٱلرَّضَٰعَةِ ﴾ ئەو ژنانەی بە ساوایی شیریانتان خواردوە، وە ئەو کچەی هاوشیرتان بووە. واتە: وەك چۆن دایکت لێت حەرامە، هەر بەو شێوەیەش ئەو دایکە کە شیری پێداوی لێت حەرامە هەر بۆیە بوخاری و موسلیم لە سەحیحەکەیاندا ڕیوایەتیان کردوە لە دایکی موسوڵمانانەوە عائیشە کە پێغەمبەری خودا (ﷺ) فەرموویەتی: (ئەوەی لە ڕێگەی لەدایك بوونەوە ببێتە مەحرەم بە شیر خواردنیش دەبێتە مەحرەم). وە لە وتەیەکی موسلیما هاتووە: (ئەو ژنانەی بەهۆی خزمایەتی ڕەچەڵەکەوە مارەکردنیان حەرامە بەهۆی شیر خواردنیشەوە هەر حەرام دەبن)[3].

---

[1] الطبري (١٤٢/٨).

[2] الطبري (١٤١/٨).

[3] فتح الباري (٤٣/٩)، مسلم (١٠٦٨/٢).

**ئەندازەی ئەوەی بە شیر پێدان حەرام دەکرێ و ماوەکەی**

بە کەمتر لە پێنج جار شیر خواردن حەرام ناکرێ وەك لە سەحیحی موسلیما هاتوە لە عائیشەوە(ڕەزای خوای لێ بێ) وتی: پێشتر ئەمە ئایەتێك بوو لە قورئاندا (عشر مرضعات معلومات يُحرِّمنَ) دە شیر خواردنی ئاشکرا حەرام دەکرێن (پاشان بە پێنج شیر خواردنی ئاشکرا سڕایەوە. کە پێغەمبەری خودا (ﷺ) وەفاتی کرد هێشتا هەندێ کەس ئەو ئایەتانەیان دەخوێندەوە[1] (بە قورئانیان دەزانی چونکە نەسخەکەیان پێ نەگەیشتبوو) وە لە فەرموودەکەی سەهلەی کچی سوهەیلەوە، کە پێغەمبەری خودا (ﷺ) فەرمانی پێدا کە پێنج جار شیر بدات بە سالمی مەولای ئەبوحوزەیفە[2]. پاشان دەبێ بزانرێ کە شیر خواردن لە تەمەنی منداڵیدا بێت و لە دوو ساڵ کەمتر بێت، وەك لە پێشەوە لە سورەتی بەقەرەدا باسمان کرد لەم ئایەتەدا: ﴿ وَٱلْوَٰلِدَٰتُ يُرْضِعْنَ أَوْلَٰدَهُنَّ حَوْلَيْنِ كَامِلَيْنِ ۖ لِمَنْ أَرَادَ أَن يُتِمَّ ٱلرَّضَاعَةَ ﴾[3] دایکان دەبێ دوو ساڵی ڕەبەق شیر بدەن، بۆ کەسێ کە بیەوێ بە تەواوی شیر بدات.

**حەرام کردنی دایکی هاوسەر و کچەکانیان**

خودای گەورە ئەفەرموێت: ﴿وَأُمَّهَٰتُ نِسَآئِكُمْ وَرَبَٰٓئِبُكُمُ ٱلَّٰتِى فِى حُجُورِكُم مِّن نِّسَآئِكُمُ ٱلَّٰتِى دَخَلْتُم بِهِنَّ فَإِن لَّمْ تَكُونُوا۟ دَخَلْتُم بِهِنَّ فَلَا جُنَاحَ عَلَيْكُمْ ﴾ خەسووتان و ئەو کچانەی خۆتان کردون بە خاوەنیان و لەو ژنانەن کە ئێوە لەگەڵیان سەرجێییتان کردون، ئەگەر سەرجێییشتان لەگەڵ نەکردوون ئەوە هیچ گوناهێکتان لەسەر نیە (لە مارە کردنی کچەکانیدا) بەڵام ژنەکە تەنیا بە مارەبڕینی کچەکە لەو پیاوە حەرام دەبێ. چووبێتە لای یا نەچووبێتە لای. بەڵام دەربارەی کچی ژنەکە تەنیا بە مارەبڕینی دایکی حەرام نابێ هەتا پیاوەکە نەچێتە لای، ئەگەر دایکەکە تەڵاق درا لە پێش چوونە لایدا، دروستە بۆ ئەو پیاوە کچەکەی بخوازێ. هەر بۆیە خودای گەورە ئەفەرموێت: ﴿وَرَبَٰٓئِبُكُمُ ٱلَّٰتِى فِى حُجُورِكُم مِّن نِّسَآئِكُمُ ٱلَّٰتِى دَخَلْتُم بِهِنَّ فَإِن لَّمْ تَكُونُوا۟ دَخَلْتُم بِهِنَّ فَلَا جُنَاحَ عَلَيْكُمْ ﴾.

**کچی ژن لە پیاوێکی تر (الربيبة) لەلای پیاوەکە بێ یان لەلای نەبێ هەر لێی حەرامە**

خودای گەورە ئەفەرموێت: ﴿وَرَبَٰٓئِبُكُمُ ٱلَّٰتِى فِى حُجُورِكُم ﴾ ئەو کچانەی کە لەلای خۆتان دەژین. زانایان کۆ دەنگن لەسەر ئەوە کە کچی ژن لە پیاوێکی تر حەرامە لە مێردی ئەو ژنە لەلای بژی

---

[1] مسلم (٢/١٠٧٥).

[2] ابوداود (٢/٥٥٠)، سەحیحە.

[3] البقرة (٢٣٣).

یان لەلای نەژی. ئەم وتارە زۆر ڕوونو ئاشکرایە، هیچ مانایەکی تر هەڵناگرێ، وەك ئەم ئایەتە کە خودای گەورە ئەفەرموێت: ﴿وَلَا تُكْرِهُوا فَتَيَاتِكُمْ عَلَى الْبِغَاءِ إِنْ أَرَدْنَ تَحَصُّنًا﴾[1] نەچن کەنیزەکانتان (کە دەیانەوێ پاك بژین) ناچار بکەن خۆ بفرۆشن. وە لە هەردوو سەحیحەکەدا هاتوە، ئوموحەبیبە کچی ئەبوسوفیان وتی: ئەی پێغەمبەری خودا (ﷺ) خوشکەکەم کچی ئەبوسوفیان مارە بکە. وە لە وتەی موسلیما هاتوە، عیزەی (عزّة) کچی ئەبوسوفیان. فەرمووی: (تۆ پێت خۆشە؟) وتی: بەڵێ، خۆ من بە تەنیا هاوسەرت نیم، خۆشەویسترین کەس کە حەز بکەم لەم خێرەدا بەشدار بێت خوشکەکەمە. فەرمووی: (ئەو بۆ من حەڵاڵ نیە)، وتی: من هەواڵم پێ گەیشتوە کە تۆ دەتەوێ کچی ئەبوسەلەمە بخوازیت. فەرمووی: (کچی ئەبوسەلەمە؟) وتی: بەڵێ، فەرمووی: (جا ئەو زڕ کچیشم نەبوایە کە دایکی حەڵاڵی خۆمە هەر بۆم حەڵاڵ نەبوو. چونکە ئەو برازای شیریمە سوییبە شیری داوە بە منو باوکی. هیچ کامێکتان باسی کچی خۆتانو خوشکی خۆتانم لەو بارەیەوە بۆ مەکەن)[2]، وە لەڕیوایەتی بوخاریدا هاتوە: (ئەگەرمنو ئوموسەلەمەیشم نەخواستایە هەر بۆم حەڵاڵ نەبوو)[3]، حەرام کردنەکەی بەستووە بە مارەکردنی ئوموسەلەمەوەو بڕیاری حەرام کردنی ئەویشی داوە.

## تەفسیری چوونەلا ( سەرجێیی کردن )

خودای گەورە ئەفەرموێت: ﴿اللَّاتِي دَخَلْتُم بِهِنَّ﴾ ئەو ژنانەی چونەتە لایان. ئیبنوعەبباسو کەسانی تریش وتویانە: یانی: ئەو ژنانەی مارەتان کردوون.[4] ئیبنوجورەیجو عەتا دەڵێن: ئەوەیە کە پێی بدرێ ئەمیش دەری بخاتو بگەڕێت بۆیو لە نێوان هەردوو قاچیدا دانیشێ. وتم: ئایا ئەگەر ببینی ئەوە بکات لە ماڵی کەسو کاری ژنەکە خۆیدا؟ وتی: وەك یەکەو بەسیەتی، ئەو کاتە کچەکەی لێ حەرام دەبێ[5].

## حەرام کردنی ژنانی کوڕ، بەڵام ژنی ئەوانەنە کە کراون بە کوڕی خۆ (المتبنیٰ)

خودای گەورە ئەفەرموێت: ﴿وَحَلَائِلُ أَبْنَائِكُمُ الَّذِينَ مِنْ أَصْلَابِكُمْ﴾ هەروەها ژنی کوڕیشتان، کە بە ڕاستی ئەو کوڕە هەر لە خۆتان بێ. واتە: ژنی ئەو کوڕانەتان لە خۆتان پەیدا بوونو لە پشتی خۆتانن لێتان حەرامە. بەمە ئەوانەی کە لە چەرخی نەفامیدا کراون بە کوڕی خۆ

---

[1] النور (٣٣).

[2] فتح الباري (٩/٦٤)، مسلم (٢/١٠٧٢).

[3] فتح الباري (٩/٦٢).

[4] الطبري (٨/١٤٨).

[5] الطبري (٨/١٤٨).

جیا کراوەتەوە. وەك خودای گەورە ئەفەرموێت: ﴿فَلَمَّا قَضَىٰ زَيْدٌ مِّنْهَا وَطَرًا زَوَّجْنَٰكَهَا لِكَيْ لَا يَكُونَ عَلَى ٱلْمُؤْمِنِينَ حَرَجٌ فِىٓ أَزْوَٰجِ أَدْعِيَآئِهِمْ﴾[1] جا کاتێ زەید لە هاوسەرەکەی خۆی بە ئارەزوو گەیشت. ئەومان کردە هاوسەری تۆ، هەتا خاوەن باوەڕەکان لە خواستنی ژنی زڕ کوڕانی خۆیان (لە دوای ئەوە تەلاقیان دان) لۆمە نەکرێن. ئیبنوجورەیج وتی: پرسیارم لە عەتا کرد لەم ئایەتەدا کە ئەفەرموێت: ﴿وَحَلَٰٓئِلُ أَبْنَآئِكُمُ ٱلَّذِينَ مِنْ أَصْلَٰبِكُمْ﴾ دەڵێت: ئێمە قسەمان دەکرد (والله أعلم) کاتێ کە پێغەمبەر (ﷺ) ژنەکەی زەیدی مارە کرد، بت پەرستەکانیش لە مەککە لەو بارەیەوە قسەیان دەکرد، خودای گەورە ئەم ئایەتەی ناردە خوارەوە: ﴿وَمَا جَعَلَ أَدْعِيَآءَكُمْ أَبْنَآءَكُمْ﴾[2] ئەو زڕ کوڕانەشی نەکردۆتە کوڕی ئێوە. ئەم ئایەتەیش هاتە خوارەوە کە ئەفەرموێت: ﴿مَّا كَانَ مُحَمَّدٌ أَبَآ أَحَدٍ مِّن رِّجَالِكُمْ﴾[3]،[4] موحەممەد بابی هیچ پیاوێك لە پیاوانی ئێوە نیە. ئیبنوئەبی حاتەم ڕیوایەتی کردوە لە حەسەنی کوڕی موحەممەدەوە وتی: ئەم ئایەتانە لەم ئایەتە موبهەمەکانە. ﴿وَحَلَٰٓئِلُ أَبْنَآئِكُمُ﴾ تا ﴿وَأُمَّهَٰتُ نِسَآئِكُمْ﴾ پاشان وتی: ڕیوایەت کراوە لە تاوس‌و ئیبراهیم‌و زوهری‌و مەکحولەوە هەر بەم شێوەیە. منیش دەڵێم: مانای موبهەمات ئەوەیە کە گشت گیرە. ئەوەی سەرجێیی لەگەڵ کرابێ‌و ئەوەیش سەرجێیی لەگەڵ نەکرابێ. تەنیا بە مارەبڕینەکەی حەرام دەبێ، ئەمەیش کۆدەنگی لەسەرە.

### دوو خوشکیش پێکەوە هێنان هەر حەرامە

خودای گەورە ئەفەرموێت: ﴿وَأَن تَجْمَعُوا۟ بَيْنَ ٱلْأُخْتَيْنِ إِلَّا مَا قَدْ سَلَفَ﴾ دوو خوشکیش پێکەوە هێنان جا مەگین هەر لە پێشوودا ئەم کارەتان بەسەرهاتبێ. واتە: هێنان‌و مارەکردنی دوو خوشك حەرام کراوە لێتان. هەروەها لە کەنیزەکیشا. مەگین لە چەرخی نەفامیدا ڕووی دابێ. لەوە خۆش بوین‌و چاوپۆشیمان لێ کردوە، ئەمە ئەوە دەگەیەنێ کە شتی وا هەرگیز لەمەودوا ڕونادات‌و براوەتەوە. وەك خودای گەورە ئەفەرموێت: ﴿لَا يَذُوقُونَ فِيهَا ٱلْمَوْتَ إِلَّا

---

[1] الاحزاب (٣٧).
[2] لاحزاب (٤).
[3] الاحزاب (٤٠).
[4] الطبري (١٤٩/٨).

ﭐلْمَوْتَةَ ٱلْأُولَىٰ﴾[1] جگە لە مەرگی یەکەم جار لەو شوێنەدا (واتە: لە بەهەشتا) تامی مردن ناچێژن. ئەم ئایەتە بەڵگەیە لەسەر ئەوە کە هەرگیز جارێکی تر مردن ناچێژن. زانایان لە هاوەڵەکانی پێغەمبەرو (ﷺ) شوێن کەوتوان و (التابعین) پێشەوایانی ئیسلام لە کۆن و تازەدا کۆ دەنگن لەسەر ئەوە کە هێنانی دوو خوشك پێکەوە حەرامە. وە هەر کەسێ کە موسوڵمان بوەو دوو خوشك ژنی بوە، سەرپشك کراوە یەکێکیان بهێڵێتەوەو دەبێ ئەوی کەیان تەڵاق بدات. ئیمامی ئەحمەد ڕیوایەتی کردوە لە زەحاکی کوڕی فیروزەوە، لە باوکیەوە، وتی: موسوڵمان بووم دوو خوشك خێزانم بوون. پێغەمبەر (ﷺ) فەرمانی پێ کردم کە یەکێکیان تەڵاق بدەم[2].

﴿وَٱلْمُحْصَنَٰتُ مِنَ ٱلنِّسَآءِ إِلَّا مَا مَلَكَتْ أَيْمَٰنُكُمْ كِتَٰبَ ٱللَّهِ عَلَيْكُمْ وَأُحِلَّ لَكُم مَّا وَرَآءَ ذَٰلِكُمْ أَن تَبْتَغُوا۟ بِأَمْوَٰلِكُم مُّحْصِنِينَ غَيْرَ مُسَٰفِحِينَ فَمَا ٱسْتَمْتَعْتُم بِهِۦ مِنْهُنَّ فَـَٔاتُوهُنَّ أُجُورَهُنَّ فَرِيضَةً وَلَا جُنَاحَ عَلَيْكُمْ فِيمَا تَرَٰضَيْتُم بِهِۦ مِنۢ بَعْدِ ٱلْفَرِيضَةِ إِنَّ ٱللَّهَ كَانَ عَلِيمًا حَكِيمًا ﴿٢٤﴾﴾

**قەدەغەکرنی ژنی مێرددار مەگین کاتێك ببن بە مولکی خۆتان(کەنیزە)**

خودای مەزن دەفەرموێت: ﴿وَٱلْمُحْصَنَٰتُ مِنَ ٱلنِّسَآءِ إِلَّا مَا مَلَكَتْ أَيْمَٰنُكُمْ﴾ ژنی بەشوتان بۆ ناشێت مەگین ئەوانەی بوونە ماڵی خۆتان(کەنیزە). واتە: ژنی خاوەن مێردی بێگانەتان لێ قەدەغەیە مەگین ئەوانەی کە بە دیل گیراون وەك(کەنیزە)، ئەوانەتان بۆ حەڵاڵە پاش دانانی سکەکەیان و تەواوبوونی عیددەیان و موسڵمان بوونیان(بچنەلایان). ئەم ئایەتە لەمبارەیەوە هاتەخوارەوە. ئیمامی ئەحمەد ڕیوایەتی کردووە لە سەعیدی کوڕی خودەریەوە وتی: چەند ژنێکمان کەوتەدەست لە دیلەکانی جەنگی ئەوتاس(أوطاس) ئەو ژنانە مێردیان هەبوو، پێمان ناخۆش بوو بڕۆینەلایان لەبەرئەوەی کە مێردیان هەبوو، بۆیە پرسیارمان لە پێغەمبەر(ﷺ) کرد، ئەم ئایەتە هاتەخوارەوە ﴿وَٱلْمُحْصَنَٰتُ مِنَ ٱلنِّسَآءِ إِلَّا مَا مَلَكَتْ أَيْمَٰنُكُمْ﴾ بەم ئایەتە داوێنی(فروج) ئەو ژنانەمان بۆ حەڵاڵ کرا.[3] ترمذیش هەروا ڕیوایەتی کردووە.[4] نەسائی ڕیوایەتی کردووە[5] ئیبنوجەریر ڕیوایەتی کردووە[6]

---

[1] الدخان (٥٦).

[2] مسلم (١٠٧٢/٢/٢).

[3] أحمد(٧٢/٣) فەرموودەیەکی سەحیحە.

[4] تحفة الاوذي(٢٨٢/٤) فەرموودەیەکی سەحیحە.

[5] النسائي فی الکبری(٣٠٨/٣).

[6] الطبري(١٥٣/٨).

موسلمیش لە سەحیحەکەیدا ڕیوایەتی کردووە.[1] پاشان خودای گەورە دەفەرمووێت: ﴿كِتَٰبَ ٱللَّهِ عَلَيۡكُمۡ﴾ لە خوداوە ئەم بڕیارەتان بۆ نوسراوە. واتە: ئەم قەدەغەکردنە خودا بۆی نوسیون، پابەندبن بە نوسراوەکەیەوە، لە سنوری دەرنەچن‌و پابەندبن بە شەریعەتەکەیەوەو ئەوەی لەسەری داناون.

### جگە لەمانەی کە باسکران مارەکردنیان دروستە

پاشان خودای مەزن دەفەرمووێت: ﴿وَأُحِلَّ لَكُم مَّا وَرَآءَ ذَٰلِكُمۡ﴾ جیا لەمانە ڕێتان پێدراوەو حەڵاڵە بۆتان(هەر ژنێك بێنن) جگە لەمانەی کە باسکران مارەکردنیان قەدەغەیە، ژنانی تر بۆتان حەڵاڵە. ئەمە قسەی عەتاو کەسانی تریشە[2] ﴿أَن تَبۡتَغُواْ بِأَمۡوَٰلِكُم مُّحۡصِنِينَ غَيۡرَ مُسَٰفِحِينَ﴾ بە پارەی خۆتان ژن بێنن، بەڵام بە پاکی بێت نەك بە داوێن پیسی، هەتا چوار ژن یان ئەوانەی بە دیل دەیانگرنبە مەیلی خۆتان بە ڕێگەی شەرعی هەربۆیە خودای مەزن فەرموویەتی: ﴿فَمَا ٱسۡتَمۡتَعۡتُم بِهِۦ مِنۡهُنَّ فَـَٔاتُوهُنَّ أُجُورَهُنَّ فَرِيضَةٗ﴾ لە بەرامبەر ئەو لەزەتەی لە ژنەکانی دەبینن، ئەو ماڵەی خودا بڕیاری داوە بۆیان بکەن(مارەیی) خۆیانە لەسەرتان فەرزکراوە بیدەن. واتە: وەك چۆن لەزەتیان لێ وەردەگرن ئاوایش مارەییەکەیان بدەنێ لە بەرامبەری ئەوەدا. وەك خودای گەورە لە ئایەتێکی تردا فەرموویەتی: ﴿وَكَيۡفَ تَأۡخُذُونَهُۥ وَقَدۡ أَفۡضَىٰ بَعۡضُكُمۡ إِلَىٰ بَعۡضٖ﴾[3]جا چۆنیان لێ دەسەننەوە کە ئێوە خۆشیتان لە یەکتری دیوەو(بەیەکەوەبوونو هەر لە جێو بانێکدا خەوتوون) وە لە ئایەتێکی تردا فەرموویەتی: ﴿وَلَا يَحِلُّ لَكُمۡ أَن تَأۡخُذُواْ مِمَّآ ءَاتَيۡتُمُوهُنَّ شَيۡـًٔا﴾[4] لەو ماڵەی کە پێتانداون دروست نیە هیچیات لێ وەربگرنەوە. وەك ئەم ئایەتەش کە خودای گەورە فەرموویەتی: ﴿وَءَاتُواْ ٱلنِّسَآءَ صَدُقَٰتِهِنَّ نِحۡلَةٗ﴾[5] وەك پیێشکەشێك مارەیی ژنەکان بدەن.

### باسی چێژوەرگرتن لە ژنان‌و(المتعه) و قەدەغەکردنی

ئیبنو عەباس‌و ئوبەیی کوڕی کەعب‌و سەعیدی کوڕی جوبەیرو سوددی ئەم ئایەتەیان بەم شێوە خوێندوەتەوە: ﴿فَمَا ٱسۡتَمۡتَعۡتُم بِهِۦ مِنۡهُنَّ إِلَىٰٓ أَجَلٖ مُّسَمّٗى فَـَٔاتُوهُنَّ أُجُورَهُنَّ فَرِيضَةٗ﴾ لەبەرامبەر ئەو

---

[1] مسلم(٢/١٠٨٠).

[2] الطبري(٨/١٧٢).

[3] النساء(٢١).

[4] البقرة(٢٢٩).

[5] النساء(٤).

چێژەی لە ژنەکانی دەبینن(تا ماوەیەکی دیاریکراو) مارەیی خۆیانە لەسەرتان فەرزکراوە ئێوە بیدەن[1] موجاهد وتی: ئەم ئایەتە لەسەر مارەبڕینی لەزەت وەرگرتن(المتعة) هاتوەتەخوارەوە.[2] ڕاستیەکەی ئەوەیە کە لە هەردوو سەحیحەکەدا هاتووە لە گەورەی موسڵمانانەوە عەلی کوڕی ئەبو تالیبەوە وتی: پێغەمبەری خودا(ﷺ) ڕێگری لە ماوسەرگیری لەزەت(المتعة) و خواردنی گۆشتی گوێ درێژی ماڵی کردووە لە ڕۆژی خەیبەردا.[3] وە لە سەحیحی موسایمدا هاتووە لە ڕەبیعی کوڕی سەبرەی مەعبەدی جوهەنیەوە(سبرة بن معبد الجهنی) لە باوکیەوە، لەگەڵ پێغەمبەری خودا(ﷺ) غەزای کردووە لە ڕۆژی فەتحی مەککەدا فەرموویەتی:(ئەی خەڵکینە، من ئیزنم پێدان کە لەزەت وەربگرن لە ژنان، بێگومان خودا ئەوەی حەرام کردووە هەتا ڕۆژی قیامەت، هەرکەسێك شتێکی لەوانە(لەو ژنانە) لەلایە با دەستی لێ هەڵبگرێت(بڕوات) هەر شتێکیشتان پێداون هیچیان لێ وەرمەگرنەوە)[4] خودای گەورە فەرموویەتی: ﴿وَلَا جُنَاحَ عَلَيْكُمْ فِيمَا تَرَاضَيْتُم بِهِۦ مِنۢ بَعْدِ ٱلْفَرِيضَةِ﴾ ئەگەر لەپاش دیاریکردنی مارەیی، لە نێوان خۆتان پێکهاتن هیچ گوناهتان ناگات. مانای ئەم ئایەتە وەك ئەم ئایەتە وایە کە خودای مەزن دەفەرمووێت: ﴿وَءَاتُوا۟ ٱلنِّسَآءَ صَدُقَـٰتِهِنَّ﴾[5] وەك بەخشینێك مارەیی ژنەکانتان بدەن. واتە: ئەگەر مارەیی بڕیاردرا بۆ ئەو ژنە، پاشان وازی لێ هێنا، یان وازی لە شتێکی هێنا بۆت، نە تۆ گوناهت دەگات لەسەری نە ئەو ژنە. ئیبنو جەریر ڕیوایەتی کردووە وتی: حەزرەمی وتی: پیاوانێك بوون مارەییان پاشان لەوانەبووە یەکێکیان توشی ناڕەحەتی‌و نەبوونی هاتبێت، فەرمووبێتی: ئەی خەڵکینە ئەگەر لە نێوان خۆتان پێکهاتن لەپاش دیاریکردنی مارەیی هیچ گوناهتان ناگات.[6] واتە: ئەگەر ژنەکە دەستی لە شتێکی لەو مارەییە هەڵگرت، ئەوە بۆ تۆ درست‌و ڕەوایە. خودای گەورە فەرموویەتی: ﴿إِنَّ ٱللَّهَ كَانَ عَلِيمًا حَكِيمًا﴾ خودا زانای کارزانە. ئەمە دوو وەسفە کە خودای مەزن وەسفی خۆی پێدەکات دوای باسکردنی ئەو قەدەغەکراوانە.

﴿وَمَن لَّمْ يَسْتَطِعْ مِنكُمْ طَوْلًا أَن يَنكِحَ ٱلْمُحْصَنَـٰتِ ٱلْمُؤْمِنَـٰتِ فَمِن مَّا مَلَكَتْ أَيْمَـٰنُكُم مِّن فَتَيَـٰتِكُمُ ٱلْمُؤْمِنَـٰتِ ۚ وَٱللَّهُ أَعْلَمُ بِإِيمَـٰنِكُم ۚ بَعْضُكُم مِّنۢ بَعْضٍ ۚ فَٱنكِحُوهُنَّ بِإِذْنِ أَهْلِهِنَّ وَءَاتُوهُنَّ

[1] الطبري(٨/١٧٦/١٧٨).

[2] الطبري(٨/١٧٦).

[3] فتح الباری(٩/٥٩٠)، مسلم(٢/١٠٢٧).

[4] مسلم(٢/١٠٢٥).

[5] النساء(٤).

[6] الطبري(٨/١٨٠).

أُجُورَهُنَّ بِٱلْمَعْرُوفِ مُحْصَنَٰتٍ غَيْرَ مُسَٰفِحَٰتٍ وَلَا مُتَّخِذَٰتِ أَخْدَانٍۚ فَإِذَآ أُحْصِنَّ فَإِنْ أَتَيْنَ بِفَٰحِشَةٍ فَعَلَيْهِنَّ نِصْفُ مَا عَلَى ٱلْمُحْصَنَٰتِ مِنَ ٱلْعَذَابِۚ ذَٰلِكَ لِمَنْ خَشِىَ ٱلْعَنَتَ مِنكُمْۚ وَأَن تَصْبِرُوا۟ خَيْرٌ لَّكُمْۗ وَٱللَّهُ غَفُورٌ رَّحِيمٌ ﴿٢٥﴾

**ڕێگەدان بە هاوسەرگیری کەنیزەکان کە توانای هاوسەرگیری ئازادی نەبوو**

خودای مەزن دەفەرمووێت: ﴿وَمَن لَّمْ يَسْتَطِعْ مِنكُمْ طَوْلًا أَن يَنكِحَ ٱلْمُحْصَنَٰتِ ٱلْمُؤْمِنَٰتِ فَمِن مَّا مَلَكَتْ أَيْمَٰنُكُم مِّن فَتَيَٰتِكُمُ ٱلْمُؤْمِنَٰتِ﴾ هەرکەسێکیش نەبوو دەستەنگەو ئەوماڵەی بۆ هەڵنەسوڕێ کە ژنی خاوەن باوەڕی ئازاد بێنێت، با لەو کیژە خاوەن باوەڕانە کە بوونەتە هی خۆتان مارە بکات. ﴿وَٱللَّهُ أَعْلَمُ بِإِيمَٰنِكُمۚ بَعْضُكُم مِّنۢ بَعْضٍ﴾ خوداش لە هەموو کەس زیاتر لە بڕواتان ئاگادارە. هەمووتان لە تیرەو نەوەی یەکترن. واتە: خودا خۆی ئاگاداری گشت کارە دیارو نادیارەکانەو ئێوە ئەی نەوەی ئادەم تەنها شتە دیارەکان دەبینن‌و دەزانن. پاشان دەفەرمووێت: ﴿فَٱنكِحُوهُنَّ بِإِذْنِ أَهْلِهِنَّ﴾ بە ئیزنی خاوەنانیان مارەیان بکەن. ئەم ئایەتە بەڵگەیە لەسەرئەوەی کە گەورەی کەنیزەکە خاوەنیەتی. هاوسەرگیری نابێت بکات بە ئیزنی گەورەکەی نەبێت. چونکە ئەوە خاوەنی بەندەکەیەتی، بەندەکەی بۆی نیە بەبێ ئیزنی ئەو هاوسەرگیری بکات. وەك لەم فەموودەیە هاتووە:(هەر بەندەیەك بێ ئیزنی خاوەنەکەی هاوسەرگیری بکات ئەوە داوێن پیسە)[1]خۆ ئەگەر خاوەنی کەنیزەکە ژن بوو ئەوە پیاوەکەی مارەی دەبڕێت بە ئیزنی ئەو. وەك لەم فەموودەیە هاتووە:(با ژن ژن مارە نەبڕێت، ژنیش خۆی مارە نەبڕێت، ژنی داوێن پیس ئەو ژنەیە کە خۆی مارەی خۆی دەب)[2] خودای گەورە دەفەرمووێت: ﴿وَءَاتُوهُنَّ أُجُورَهُنَّ بِٱلْمَعْرُوفِ﴾ چۆن باوە لە نێوان خۆتاندا مارەییان بۆ ببڕنەوە بە دڵی خۆتان‌و مارەیی باشیان بۆ ببڕنەوەو هیچ غەدریان لێ مەکەن‌و بە سوك سەیریان مەکەن لەبەرئەوەی کەنیزەکەی بەردەست خۆتانن. ﴿مُحْصَنَٰتٍ غَيْرَ مُسَٰفِحَٰتٍ﴾ با ئەوانیش کەنیزانی داوێن پاك بن. لەو داوێن پیسانە نەبن کە ڕێگری ناکەن لە هەرکەسێك بیەوێت داوێن پیسیان لەگەڵدا بکات. ﴿وَلَا مُتَّخِذَٰتِ أَخْدَانٍ﴾ نە داوێن پیس، لەژێرەوە دۆستی نێرینەیان نەبێت. ئیبنو عەباس وتی:(المسافحات) ئەوانەن کە بە ئاشکرا داوێن پیسی دەکەن.[3] واتە: ئەو داوێن پیسانەن

---

[1] أبو داود(٢/٥٦٣) فەرموودەیەکی سەحیحە.

[2] ابن ماجة(١/٦٠٦) سەرەتا ئەم فەرموودەیە سەحیحە کۆتاییەکەی لاواز.

[3] الطبري(٨/١٩٣).

كە ڕێگری ناکەن لە هەرکەسێك داوێن پیسیان لەگەڵدا بکات.(والمتخذان أخذان) واتە: ئەوانەی لە ژێرەوە دۆستی نێرینەیان هەیە. هەر بەم شێوەیەش ڕیوایەت کراوە لە ئەبو هورەیرەوەو موجاهدو شەعبیو زەحاكو عەتای خوراسانیو یەحیای کوڕی ئەبی کەسیر(کثیر) موقاتیلو سوددیەوە کە وتویانە: مەبەست پێی دۆستی نێرینەیە لەژێرەوە[1].

**کەنیزە کاتێك داوێن پیسی کرد نیوەی سزای ئازار دەدرێت**

خودای مەزن دەفەرموویێت: ﴿فَإِذَآ أُحۡصِنَّ فَإِنۡ أَتَيۡنَ بِفَٰحِشَةٖ فَعَلَيۡهِنَّ نِصۡفُ مَا عَلَى ٱلۡمُحۡصَنَٰتِ مِنَ ٱلۡعَذَابِ﴾ بەڵام ئەگەر لەپاش ئەوەی بوونە هاوسەری ئێوە دەستیان لەگەڵ پیاوی نامەحرەم تێکەڵکرد، ئازاردانیان نیوەی ئەو ژنانە دەبێت کە هاوسەریان هەیەو ئازادن. مەبەست لە(الاحصان) لێرەدا شوکرنە. چونکە دەقی ئەم ئایەتە بەڵگەیە لەسەری کە دەفەرموویێت: ﴿وَمَن لَّمۡ يَسۡتَطِعۡ مِنكُمۡ طَوۡلًا أَن يَنكِحَ ٱلۡمُحۡصَنَٰتِ ٱلۡمُؤۡمِنَٰتِ فَمِن مَّا مَلَكَتۡ أَيۡمَٰنُكُم مِّن فَتَيَٰتِكُمُ ٱلۡمُؤۡمِنَٰتِ﴾ والله أعلم. ئەم ئایەتە پیرۆزە دەقەکەی هەموو باسی کیژێکی کەنیزەی خاوەن باوەڕ دەکات، کەواتە مەبەست بە ﴿فَإِذَآ أُحۡصِنَّ﴾ واتە: کاتێك کە شوویان کرد، وەك ئیبنو عەبباسو کەسانی تریش کە هاوڕای ئەون هەر وا مانایان کردووە.[2] خودای گەورە دەفەرموویێت: ﴿نِصۡفُ مَا عَلَى ٱلۡمُحۡصَنَٰتِ مِنَ ٱلۡعَذَابِ﴾ ئازاردانیان نیوەی ئەو ژنانە دەبێت کە شوویان هەیەو ئازادن. ئەم ئایەتە بەڵگەیە لەسەر ئەوە کە مەبەست بەو ئازاردانە کە هەڵدەگرێت بکرێتە نیوەی بریتیە لە قەمچی لێدان نەك بەردەباران(الرجم) والله أعلم. وە دەفەرموویێت: ﴿ذَٰلِكَ لِمَنۡ خَشِيَ ٱلۡعَنَتَ مِنكُمۡ﴾ ئەمە بۆ کەسێکە لە ئێوە لە تاوانکردن(داوێن پیسی بترسێت) لەبێ ژنەکان. واتە: لەبەرئەوە مارەکردنی کەنیزە ڕێی پێدراوە بەو مەرجانەی لە پێشەوە باسکرا، بۆ ئەو کەسانە کە لە خۆی دەترسێت تووشی داوێن پیسی ببێت، زۆر بەلایەوە گران بێتو خۆی بۆ ڕانەگیرێت. ئا لەو ماڵەدا هاوسەرگیری دەکات لەگەڵ کەنیزەیەکدا. بەڵام ئەگەر واز لەو هاوسەرگیریە بێنێتو هەوڵبدات خۆی بپارێزێت لە داوێن پیسی ئەوە چاکترە بۆی، چونکە ئەگەر مارەی کردو منداڵی بوو، منداڵەکانی دەبنە کۆیلەی گەورەی کەنیزەکە، لەبەرئەوەیە خودای گەورە فەرموویەتی: ﴿وَأَن تَصۡبِرُواْ خَيۡرٞ لَّكُمۡۗ وَٱللَّهُ غَفُورٞ رَّحِيمٞ﴾ ئەگەر ئێوە خۆڕاگر بن، بێگومان بۆتان باشترە، خودا لە هەڵە دەبورێتو دلۆڤانە.

---

[1] الطبري(٨/١٩٤)

[2] الطبري(٨/٢٠٢).

﴿ يُرِيدُ ٱللَّهُ لِيُبَيِّنَ لَكُمْ وَيَهْدِيَكُمْ سُنَنَ ٱلَّذِينَ مِن قَبْلِكُمْ وَيَتُوبَ عَلَيْكُمْ ۗ وَٱللَّهُ عَلِيمٌ حَكِيمٌ ﴿٢٦﴾ وَٱللَّهُ يُرِيدُ أَن يَتُوبَ عَلَيْكُمْ وَيُرِيدُ ٱلَّذِينَ يَتَّبِعُونَ ٱلشَّهَوَٰتِ أَن تَمِيلُوا۟ مَيْلًا عَظِيمًا ﴿٢٧﴾ يُرِيدُ ٱللَّهُ أَن يُخَفِّفَ عَنكُمْ ۚ وَخُلِقَ ٱلْإِنسَٰنُ ضَعِيفًا ﴿٢٨﴾ ﴾

ئەی خاوەن باوەڕان خودای گەورە دەیەوێت ئەوەی حەڵاڵەو ئەوەی حەرامە بۆتان ڕوون بکاتەوە، وەك لە پێشەوە لەم سورەتەداو لە شوێنی تریشدا باسی کردووە بۆیە لێرەشدا دەفەرمووێت: ﴿ يُرِيدُ ٱللَّهُ لِيُبَيِّنَ لَكُمْ وَيَهْدِيَكُمْ سُنَنَ ٱلَّذِينَ مِن قَبْلِكُمْ ﴾ خودا دەیەوێت ڕێتان بۆ ڕوون بکاتەوەو لە ڕێوشوێنی پێشینانیش شارەزاتان بکات تا ئێوەش پەیڕەوی ئەو بەرنامانەی بن کە خۆشی لێی دێ‌و لێی ڕازیە. ﴿ وَيَتُوبَ عَلَيْكُمْ ۗ وَٱللَّهُ عَلِيمٌ حَكِيمٌ ﴾ تەوبەتان لێ قبوڵ دەکات، خودا زانای لە کارزانە لە شەرعیداو وە لە بڕیاریداو وە لە کرداروو گوفتاریدا. پاشان دەفەرمووێت: ﴿ وَٱللَّهُ يُرِيدُ أَن يَتُوبَ عَلَيْكُمْ وَيُرِيدُ ٱلَّذِينَ يَتَّبِعُونَ ٱلشَّهَوَٰتِ أَن تَمِيلُوا۟ مَيْلًا عَظِيمًا ﴾ خودا دەیەوێت تەوبەتان لێ قبوڵ بکات، ئەوانەش وا دەکەونە شوێن هەواو هەوەسی دەیانەوێت(بەتەواوی) لە ڕێگە لابدەن. واتە: شوێنکەوتوانی شەیتان لە گاورو جولەکەو داوێن پیسەکان دەیانەوێت بەتەواوی لە ڕێگەی ڕاست لاتان بدەن‌و بتانخەنەسەر ڕێگای خراپو بەتاڵ. وە دەفەرمووێت: ﴿ يُرِيدُ ٱللَّهُ أَن يُخَفِّفَ عَنكُمْ ﴾ خودا دەیەوێت ئەرکتان لەسەر سوك بکات. لە شەریعەتو لەوەی فەرمانی داوە بیکەن‌و لەوەی قەدەغەی کردووە و لەویش بۆتان دادەنێت، هەر لەبەرئەوەشە کە مارەکردنی کەنیزەی بۆ ڕەواداون بەو مەرجانەی کە بۆی دیاریکراوە وەك موجاهدو کەسانی تریش وتویان.[1] ﴿ وَخُلِقَ ٱلْإِنسَٰنُ ضَعِيفًا ﴾ مرۆڤیش بە بێ هێزیو پێزی دروستبووە. واتە: مرۆڤ خۆی بۆ خۆی لاوازو بێ هێزە ورەی لاوازە، لێبڕاوی لاوازە. ئیبنو ئەبی حاتەم ڕیوایەتی کردووە. لە تاوسەوە لەم دەقەدا کە خودای گەورە دەفەرمووێت: ﴿ وَخُلِقَ ٱلْإِنسَٰنُ ضَعِيفًا ﴾ وتی: واتە مرۆڤ لەبارەی ئاخیرەتەوە لاوازە. واتە: خۆی پێ ناگیرێت.[2] وەکیع وتی: مرۆڤ لەلای ئاخیرەتدا ئاوەز لەدەست دەدات.

﴿ يَٰٓأَيُّهَا ٱلَّذِينَ ءَامَنُوا۟ لَا تَأْكُلُوٓا۟ أَمْوَٰلَكُم بَيْنَكُم بِٱلْبَٰطِلِ إِلَّآ أَن تَكُونَ تِجَٰرَةً عَن تَرَاضٍ مِّنكُمْ ۚ وَلَا تَقْتُلُوٓا۟ أَنفُسَكُمْ ۚ إِنَّ ٱللَّهَ كَانَ بِكُمْ رَحِيمًا ﴿٢٩﴾ وَمَن يَفْعَلْ ذَٰلِكَ عُدْوَٰنًا وَظُلْمًا فَسَوْفَ

---

[1] الطبری(٨/٢١٥).

[2] الطبری(٨/٢١٦).

نُصْلِيهِ نَارًا ۚ وَكَانَ ذَٰلِكَ عَلَى ٱللَّهِ يَسِيرًا ﴿٣٠﴾ إِن تَجْتَنِبُوا۟ كَبَآئِرَ مَا تُنْهَوْنَ عَنْهُ نُكَفِّرْ عَنكُمْ سَيِّـَٔاتِكُمْ وَنُدْخِلْكُم مُّدْخَلًا كَرِيمًا ﴿٣١﴾ ﴾

**قەدەغەكردنی بەدەست هێنانی ماڵی حەرام**

خودای گەورە ڕێگری لە عەبدە خاوەن باوەڕەكانی دەكات كە ماڵو سامانی یەكتری بە ناحەق بخۆن. واتە: بە چەندین شێوازی نادروست هەوڵی بەدەست هێنانی سەرمایە بدەن وەك جۆرەكانی سووخۆریو قومارو هاوشێوەیان بە فڕوفێڵ كردن لە خەڵكی. هەرچەندە واش دەركەوێت لەناو خەڵكدا ئەو مامەڵەیە بەپێی شەرعە. ئەوكەسەی بەوكارە هەڵدەستێت خودا دەزانێت كە دەیەوێت سوخۆری بكات بەو فێڵ كردنە. ئیبنو جەریر ڕیوایەتی كردووە لە ئیبنو عەباسەوە لەبارەی پیاوێكەوە كە كراسێكی دەكری لە پیاوێك دەیوت: ئەگەر پێی ڕازی بووم بردومە، ئەگەر گێڕامەوە درهەمێكیشی لەگەڵدا دەگێڕمەوە، وتی: ئەوەیە كەخودای گەورە دەفەرموێت: ﴿ يَٰٓأَيُّهَا ٱلَّذِينَ ءَامَنُوا۟ لَا تَأْكُلُوٓا۟ أَمْوَٰلَكُم بَيْنَكُم بِٱلْبَٰطِلِ ﴾[1] ئەی كۆمەڵی خاوەن باوەڕان ماڵو سامانی یەكتری(لە خۆتو خۆبایی) مەخۆن. عەلی كوڕی ئەبو تەلحە لە ئیبنو عەباسەوە وتی: كاتێك خودای مەزن ئەم ئایەتەی ناردەخوارەوە: ﴿ يَٰٓأَيُّهَا ٱلَّذِينَ ءَامَنُوا۟ لَا تَأْكُلُوٓا۟ أَمْوَٰلَكُم بَيْنَكُم بِٱلْبَٰطِلِ ﴾ موسڵمانەكان وتیان: خودای گەورە لێی قەدەغەكردووین ماڵی یەكتری بەخۆتو خۆڕایی بخۆین لەناو خۆماندا. خواردنیش چكترین ماڵمانە، دروست نیە بۆ هیچ كەسێك لە ئێمە لەلای كەسی تر خواردن بخوات. ئەی خەڵكی چی بكات؟ پاشان خودای مەزن ئەمەی ناردەخوارەوە: ﴿ لَّيْسَ عَلَى ٱلْأَعْمَىٰ حَرَجٌ ﴾[2] كوێر گلەیی(گوناهی) لەسەر نیە. تا كۆتایی ئایەتەكە. قەتادەش هەر واهی وتوە پاشان خودای گەورە دەفەرموێت: ﴿ إِلَّآ أَن تَكُونَ تِجَٰرَةً عَن تَرَاضٍ مِّنكُمْ ﴾ مەگین بە بازرگانیو بە ڕازی بوون لەناو خۆتاندا ئەوسا پێتان ڕەوایە. ﴿ تِجَٰرَةً ﴾ بە مەرفوعی خوێنداوەتەوەو بە مەنسوبیش كە ئیستسنای مونقەتیعە(بالرفع والنصب وهو استثناء منقطع ) وەك ئەوەی بفەرموێت: مامەڵە مەكەن بەهۆكاری حەرام بۆ وەدەست هێنانی سامان. بەڵكو مامەڵەو بازرگانی بكەن لە نێوان خۆتاندا بە شێوەی شەرعیو دروستو بە ڕازی بوونی هەردوولا ئەوەی دەكڕێتو ئەوەی دەفرۆشێت. بەوهۆیەوە دارایی

---

[1] الطبری(٨/٢١٧).

[2] النور(٦١).

وەدەست بێنن. موجاهد وتی: ﴿إِلَّآ أَن تَكُونَ تِجَٰرَةً عَن تَرَاضٍ مِّنكُمۡ﴾ ئەو ڕازی بوونە لەیەکتری بۆ بازرگانیەو بۆ خەڵاتیشە کەسێك شتێك ببەخشێت بە کەسێکی تر.[1] ئیبنو جەریر ڕیوایەتی کردووە.

**خیاری مەجلیس لە کڕین و فرۆشتندا( پێش جیابوونەوە لەو دانیشتنەدا ) لە بازرگانیدا لەتەواوی ڕازی بوونە لەیەکتری**

لەتەواوی ڕازی بوون لە یەکتری لە کڕین و فرۆشتندا سەلماندنی ئارەزومەندیە لەو دانیشتنەدا وەك لە هەردوو سەحیحەکەدا هاتووە کە پێغەمبەری خودا(ﷺ) فەرموویەتی:(کڕیارو فرۆشیار خواستیان ئازادە پێش ئەوەی لەیەکتر جیاببنەوە)[2] وە لە وتەی بوخاریدا هاتووە کە پێغەمبەری خودا(ﷺ) فەرمووی:(ئەگەر دووکەس کڕین و فرۆشتنیان کرد هەردووکیان بۆیان هەیە پەشیمان ببنەوە پێش ئەوەی لە یەکتر جیاببنەوە)[3] واتە: بەو مەرجەی لە یەکتر جیانەبنەوە لەو دانیشتنەدا.

**قەدەغەکردنی کوشتنی گیان و هەڕەشە لەسەری**

خودای مەزن دەفەرمووێت: ﴿وَلَا تَقۡتُلُوٓاْ أَنفُسَكُمۡ﴾ خۆتان مەکوژن(بە ناحەق). واتە: خۆتان لەناومەبەن بە شکاندنی سنورەکانی خوداو سەرپێچی فرمانەکانی و خواردنی ماڵی یەکتری بە ناهەق.

﴿إِنَّ ٱللَّهَ كَانَ بِكُمۡ رَحِيمٗا﴾ خودا دەربارەی هەمووتان دلۆڤانە، واتە: لەوشتانەی کە فرمانی پێکردون و لێشی قەدەغەکردون، ئیمامی ئەحمەد ڕیوایەتی کردووە لە عەمری کوڕی عاسەوە(ڕەزای خودای لێ بێت) کە وتویەتی: کاتێك پێغەمبەر(ﷺ) ناردویەتی لەو ساڵەدا کە پێی وترا(ذات السلاسل) وتی: لە شەوێکی زۆر ساردا توشی لەشگرانی بووم(شەیتانی بووم) ترسام لەوەی ئەگەر خۆم بشۆم لەناوبچم، تەیەمومم کرد پاشان نوێژی بەیانیم بۆ هاوەڵەکانم کرد. وتی: کاتێك کە هاتمەوە بۆ لای پێغەمبەری خودا(ﷺ) ئەوەم بۆ باسکرد فەرمووی:(ئەی عامر نوێژت بۆ هاوەڵەکانت کردو تۆ لەشت پیس بوو) وتی: وتم ئەی پێغەمبەری خودا(ﷺ) من لە شەوێکی زۆر ساردا توشی لەشگرانی بووم، ترسام ئەگەر خۆم بشۆم لەناوبچم ئەم ئایەتەی خودای مەزن وەبیرهاتەوە کە دەفەرمووێت: ﴿وَلَا تَقۡتُلُوٓاْ أَنفُسَكُمۡ إِنَّ ٱللَّهَ كَانَ بِكُمۡ رَحِيمٗا﴾ تەیەمومم کرد پاشان نوێژم کرد. پێغەمبەری خودا(ﷺ) پێکەنی و هیچی نەوت[4] ئەبو داودیش هەروا ڕیوایەتی کردووە[5] ئیبنو مەردەویهی(مردەیە) لەسەر ئەم ئایەتە پیرۆزە ئەم

---

[1] الطبری(٨/٢٠٢).

[2] فتح الباری(٤/٣٨٥)، مسلم(٣/١١٦٣).

[3] فتح الباری(٤/٣٩٠).

[4] أحمد(٤/٢٠٣/٢٠٤) فەرموودەیەکی حەسەنە.

[5] أبو داود(٣٣٤) فەرموودەیەکی حەسەنە.

فەرموودەیەی ڕیوایەت کردووە لە ئەبو هورەیرەوە وتی: پێغەمبەری خودا(ﷺ) فەرموویەتی:(هەرکەسێك بە پارچە ئاسنێك خۆی بکوژێت، پارچە ئاسنەکە لە دەستیا دەبێت و ورگی خۆی پێ ڕادەدات لەناو ئاگری جەهەننەمدا دەمێنێتەوە بە هەتاهەتایی، وە هەرکەسێك ژەهراو بخواتەوەو خۆی پێ بکوژێت ئەوە لەناو ئاگری جەهەننەمدا قوم لەدوای قوم دەیخواتەوە بەهەتا هەتایی لەناو ئاگری جەهەننەمدا دەمێنێتەوە، وە هەرکەسێك لە شاخێك خۆی بەرداتەخوارەوەو خۆی بکوژێت بەردەوام لەناو ئاگر خۆی بەردەداتەوەو بۆ هەتاهەتایی تێیدا دەمێنێتەوە). وە ئەم فەرموودەیە لە هەردوو سەحیحەکەدا هاتووە[1] لە ئەبو قەلابەوە لە سابتی کوڕی زەحاکەوە(ڕەزای خودای لێ بێت) وتی: پێغەمبەری خودا(ﷺ) فەرموویەتی:(هەرکەسێك خۆی کوشت بە هەرشتێك لە ڕۆژی قیامەتدا بەوە سزا دەدرێت)[2] زانایانی تری فرموودەش ئەم فەرموودەیان لە کتێبەکەیاندا هێناوە. هەربۆیە خودای مەزن دەفەرمووێت: ﴿وَمَن يَفۡعَلۡ ذَٰلِكَ عُدۡوَٰنٗا وَظُلۡمٗا فَسَوۡفَ نُصۡلِيهِ نَارٗا﴾ هەرکەسێکیش بە ناهەق و هەر بەنیازی دەستدرێژی ئەم جۆرە کارانە بکات، گرفتاری ئاگری دەکەین. واتە: بزانێت حەرامەو بوێرێت و زات بکات ئەوکارە بکات، بەمزوانە دەیخەینە ناو ئاگر. ئەمەش هەڕەشەیەکی زۆر توندو تیژە ﴿وَكَانَ ذَٰلِكَ عَلَى ٱللَّهِ يَسِيرًا﴾ ئەم کارە لەلای خودا زۆر ئاسانە، با هەرکەسێك خاوەنی ئاوەزە.

## چاوپۆشی لە گوناهە بچوکەکان ئەگەر دوورەپەرێزی بوو لە گوناهە گەورەکان

خودای مەزن دەفەرمووێت: ﴿إِن تَجۡتَنِبُواْ كَبَآئِرَ مَا تُنۡهَوۡنَ عَنۡهُ نُكَفِّرۡ عَنكُمۡ سَيِّـَٔاتِكُمۡ﴾ ئەگەر ئێوە لەو تاوانە گەورانە پێمان ڕاگەیاندوون نەیکەن و خۆتان دوورەپەرێز بگرن، هەڵەو پەڵەی دیکەتان لەسەر لادەبەین. واتە: ئەگەر وازتان لە گوناهە گەورەکان هێنا کە لێتان قەدەغەکرابوو، ئەوا ئێمەش لە گوناهە بچوکەکانتان چاوپۆشی دەکەین و دەتانخەینە بەهەشت، بۆیە خودای گەورە دەفەرمووێت: ﴿وَنُدۡخِلۡكُم مُّدۡخَلٗا كَرِيمٗا﴾ دەتانبەینە شوێنێکی بەقەدرو شکۆدار. هەندێك فەرموودە پەیوەندی بەم ئایەتە پیرۆزەوەیە لێرەدا باسیان دەکەین. لەوانە: ئیمامی ئەحمەد ڕیوایەتی کردووە لە سەلمانی فارسیەوە وتی: پێغەمبەری خودا(ﷺ) پێی فەرمووم:(دەزانی ڕۆژی هەینی چیە؟) وتم: ئەوڕۆژەیە کە خودای گەورە باوکتانی تێیدا کۆکردوەتەوە، فەرمووی:(بەڵام من دەزانم ڕۆژی هەینی چیە، هەر پیاوێك خۆی خاوێن بکاتەوەو دەست نوێژێکی چاك بگرێت، پاشان بێت بۆ نوێژی هەینی بێدەنگ بێت تا ئیمام لە نوێژەکەی دەبێتەوە مەگین دەبێتەهۆی سڕینەوەی گوناهەکانی نێوان ئەو

---

[1] البخاري(٥٧٧٨)، مسلم(١٠٩).

[2] أحمد(٣٣/٤) فەرموودەیەکی سەحیحە.

هەیینییەو هەینی داهاتوو ئەگەر لە گوناهە گەورەکان(کوشندەکان) پارێزراو بێت)[1] بوخاریش ڕیوایەتی کردووە لە سەلمانەوە هەر بەوشێوەیە.

## حەوت گوناهە لەناوبەرە خراپەکان

لە هەردوو سەحیحەکەدا هاتووە کە پێغەمبەری خودا(ﷺ) فەرموویەتی:(دوورکەنەوە لەو حەوت گوناهە لەناوبەرانە) وترا: ئەوانە چین ئەی پێغەمبەری خودا(ﷺ)؟ فەرمووی:(هاوەڵ بڕیاردان بۆ خودا، کوشتنی کەسێك بە ناڕەوا، جادووکردن، خواردنی ماڵی هەتیو، پشت هەڵکردن لە ڕۆژێکدا کە موسڵمان‌و نا موسڵمان ڕووبەڕووبوونەتەوە، تاوانبارکردنی ئافرەتی پاك‌و بێوادارو بێئاگا لە داوێن پێسی)[2].

## فەرموودەیەکی تر لە باسی شایەتی دانی درۆ

ئیمامی ئەحمەد ڕیوایەتی کردووە لە ئەنەسی کوڕی مالیکەوە وتی: پێغەمبەری خودا(ﷺ) باسی گوناهە گەورەکانی کرد. یان پرسیاری لێکرا لەبارەی گوناهە گەورەکانەوە، فەرمووی: (هاوبەشی دانان بۆ خودا، کوشتنی گیان(نفس)، سەرپێچی(ئازاردانی) دایك‌و باوك) پاشان فەرمووی ئایا ئاگادارتان بکەم لە گەورەترین گوناه؟ فەرمووی:(قسەی درۆ یان شایەتی درۆ) شوعبە وتی: زیاتر وادەزانم فەرمووی:(شایەتی درۆ)[3] بوخاری‌و موسلیم فەرموودەکەی شوعبەیان هەروا هێناوە[4].

## فەرموودەیەکی تر

بوخاری‌و موسلیم ڕیوایەتیان کردووە لەم فەرموودەی عەبدوڕەحمانی کوڕی ئەبی بکردا لە باوکیەوە وتی: پێغەمبەر(ﷺ) فەرمووی:(ئایا ئاگادارتان بکەم لە گەورەترین گوناه؟) وتمان بەڵێ ئەی پێغەمبەری خودا(ﷺ)، فەرمووی:(ئەوسا بزانن شایەتی درۆ، ئەوسا بزانن قسەی درۆ) بەردەوام ئەو قسەی دەفەرموو هەتا وتمان خۆزگە بێدەنگ بوایە[5].

## فەرموودەیەکی تر باسی کوشتنی منداڵ دەکات

لە هەردوو سەحیحەکەدا هاتووە لە عبدالله ی کوڕی مەسعودەوە وتی: وتم ئەی پێغەمبەری خودا(ﷺ) چ گوناهێك زۆر گەورەیە؟ لە ڕیوایەتێکی تردا:(أکبر) زلترە. فەرمووی:(هاوبەشی بۆ خودا دانێیت کە ئەو دروستی کردوویت)، وتم: پاشان چی تر؟ فەرمووی:(داوێن پیسی بکەیت لەگەڵ ژنی

---

[1] أحمد(٥/٤٣٩) فەرموودەیەکی حەسەنە.

[2] فتح الباری(٥/٤٦٢)، مسلم(١/٩٢).

[3] أحمد(٣/١٣١) فەرموودەیەکی سەحیحە.

[4] فتح الباری(١٠/٤١٩)، مسلم(١/٩١).

[5] فتح الباری(٥/٣٠٩)، مسلم(١/٩١).

دراوسێیەکەت)[1] پاشان ئەم ئایەتەی خوێند ﴿وَٱلَّذِينَ لَا يَدۡعُونَ مَعَ ٱللَّهِ إِلَٰهًا ءَاخَرَ وَلَا يَقۡتُلُونَ ٱلنَّفۡسَ ٱلَّتِي حَرَّمَ ٱللَّهُ إِلَّا بِٱلۡحَقِّ وَلَا يَزۡنُونَۚ وَمَن يَفۡعَلۡ ذَٰلِكَ يَلۡقَ أَثَامًا﴾ ئەوکەسانەی جگە لە خودا هیچ شتێك ناپەرستن، کەسێکیش ناکوژن کە خودا ڕشتنی خوێنی بە ناڕەوا زانیوە، مەگین بەهەق، داوێن پیسی ناکەن، هەرکەسێك ئەم کارانە بکات تاوانی خۆی دێتەوە ڕێی. هەتا دەگاتە ﴿إِلَّا مَن تَابَ﴾[2] مەگین ئەوەی تۆبە بکات.

### فەرموودەیەکی تر

لە عەبدوڵڵای کوڕی عەمرەوە لە پێغەمبەرەوە(ﷺ) کە فەرموویەتی:(گەورەترین گوناه هاوبەشی دانانە بۆ خودا، وەئازاردانی دایكو باوك یان کوشتنی گیان. شوعبە کە فەرموودەکەی ڕیوایەتکردووە گومانی بوو لە یەکێك لەم دووانە(وە شوێنێك خاوەنەکەی نوقم بکات لە گوناهدا)) بوخاریو تیرمیزیو نەسائی ڕیوایەتیان کردووە[3].

### فەرموودەیەکی تر

لە عەبدوڵڵای کوڕی عەمرەوە(کەسێك ببێت بەهۆی ئەوەی جنێو بە دایكو باوکی بدرێت) وتی: پێغەمبەری خودا(ﷺ)فەرمووی:(بێگومان لە گەورەترین گوناهەکان ئەوەیە، پیاو جنێو بدات بە دایكو باوکی خۆی) وتیان: چۆن پیاو جنێودەدات بە دایكو باوکی خۆی؟ فەرمووی:(ئەو پیاوەی جنێو دەدات بە باوکی پیاوێك ئەویش جنێو دەدات بە باوکی، وە جنێو دەدات بە دایکی ئەویش جنێو دەدات بە دایکی)هەر بەم شێوەیە موسلیمش ڕیوایەتی کردووە[4] تیرمیزی وتی: فەرموودەیەکی سەحیحە. وە لە هەردوو سەحیحەکەدا هاتووە کە پێغەمبەری خودا(ﷺ) فەرموویەتی:(جنێودان بە موسڵمانان لەڕێ لادانە، کوشتنیشی خودانەناسیە)[5].

﴿وَلَا تَتَمَنَّوۡاْ مَا فَضَّلَ ٱللَّهُ بِهِۦ بَعۡضَكُمۡ عَلَىٰ بَعۡضٖۚ لِّلرِّجَالِ نَصِيبٞ مِّمَّا ٱكۡتَسَبُواْۖ وَلِلنِّسَآءِ نَصِيبٞ مِّمَّا ٱكۡتَسَبۡنَۚ وَسۡـَٔلُواْ ٱللَّهَ مِن فَضۡلِهِۦٓۚ إِنَّ ٱللَّهَ كَانَ بِكُلِّ شَيۡءٍ عَلِيمٗا ﴿٣٢﴾﴾

---

[1] فتح الباری(٨/ ٣٥٠)، مسلم(١/ ٩٠).

[2] الفرقان(٦٨– ٧٠).

[3] أحمد(٢/ ٢٠١)، البخاری(٦٦٧٥)، تحفة الاحوذي(٣٠٢١)، النسائي(٨/ ٦٣) فەرموودەیەکی سەحیحە.

[4] مسلم(٩٠).

[5] البخاری(٥٩٧٣)، مسلم(٦٤).

**قەدەغەکردنی ئاوات خواستن بەوشتانەی کە خودا داویّتی بە کەسانی تر**

ئیمامی ئەحمەد ڕیوایەتی کردووە لە ئوموسەلەمەوە وتی: ئەی پێغەمبەری خودا(ﷺ) پیاوان غەزا دەکەن، ئێمە غەزا ناکەین،(وە ئێمەی) ئافرەتان نیوەی میراتیش بۆ ئێمەیە، خودای گەورە ئەم ئایەتەی ناردەخوارەوە: ﴿وَلَا تَتَمَنَّوْا مَا فَضَّلَ اللَّهُ بِهِ بَعْضَكُمْ عَلَىٰ بَعْضٍ﴾[1] نابێت ئاوات بەوشتانە بخوازن بەوانە هەندێك لە ئێوەی بەرامبەر بە هەندێکی تر سەرخستووە. تیرمیزیش ڕیوایەتی کردووە[2] پاشان خودای گەورە دەفەرمووێت: ﴿لِّلرِّجَالِ نَصِيبٌ مِّمَّا اكْتَسَبُوا ۖ وَلِلنِّسَاءِ نَصِيبٌ مِّمَّا اكْتَسَبْنَ﴾ پیاوان بەپێی کردەوەو کۆششیی خۆیانو ژنانیش بەپێی کردەوەی خۆیانو(هەر کامیان) بەشی خۆیان هەیە. واتە: هەریەکەیان بەپێی کردەوەی پاداشتی هەیە چاکە بە چاکەو خراپەش بە سزادان. ئەمە قسەی ئیبنو جەریرە. ئیبنو عەباس وتی: ئەم ئایەتە لەبارەی میراتەوەیە واتە: هەرکەسە بەپێی خۆی میرات وەردەگرێت. پاشان خودای گەورە ڕێنماییان دەکات بۆ ئەوەی بۆیان چاکەو دەفەرمووێت: ﴿وَاسْأَلُوا اللَّهَ مِن فَضْلِهِ﴾ ئێوە دەبێت هەر داوا لە خودا بکەن چاکەتان دەربارە بکات. واتە: ئاوات مەخوازن بەوشتانەی کە خودا داویّتی بە کەسانی تر لە ئێوەو نەیداوە بە کەسانێکی تر، چونکە ئەوشتانە لەلای خودا براوەتەوە، ئاوات خواستن هیچ سودێکی نیە، بەڵکو دەبێت داوا لە من بکەن کە چاکەتان دەربارە بکەم منیش پێتان دەدەم ، بێگومان من بەخشندەو میهرەبانم. پاشان دەفەرمووێت: ﴿إِنَّ اللَّهَ كَانَ بِكُلِّ شَيْءٍ عَلِيمًا﴾ بێگومان خودا خۆی لە هەموو شت ئاگادارە. واتە: ئاگادارە بەوەی کێ شایەنی دونیایە هەتا بەشی بداتو وە کێش شایەنی هەژاریە هەژاری بکات، ئاگادارە بەوەش کە شایەنی ڕۆژی قیامەتەو دەرفەتی دەدات بۆ کارکردن بۆ ئەوڕۆژە، وە کێش شایەنی ڕیسوایە تا ڕیسوای بکاتو دوورکەوێتەوە لە چاکەو هۆکارەکانی. بۆیە دەفەرمووێت: ﴿إِنَّ اللَّهَ كَانَ بِكُلِّ شَيْءٍ عَلِيمًا﴾.

﴿وَلِكُلٍّ جَعَلْنَا مَوَالِيَ مِمَّا تَرَكَ الْوَالِدَانِ وَالْأَقْرَبُونَ ۚ وَالَّذِينَ عَقَدَتْ أَيْمَانُكُمْ فَآتُوهُمْ نَصِيبَهُمْ ۚ إِنَّ اللَّهَ كَانَ عَلَىٰ كُلِّ شَيْءٍ شَهِيدًا ﴿٣٣﴾﴾

خودای مەزن دەفەرمووێت: ﴿وَلِكُلٍّ جَعَلْنَا مَوَالِيَ مِمَّا تَرَكَ الْوَالِدَانِ وَالْأَقْرَبُونَ ۚ وَالَّذِينَ عَقَدَتْ أَيْمَانُكُمْ فَآتُوهُمْ نَصِيبَهُمْ﴾ دایكو باوكو خزمە زۆر نزیكەكانو ئەوكەسانەی پەیمانتان

---

[1] أحمد(٦/٣٢٢) فەرموودەیەکی مونقەتیعە

[2] تحفة الاحوذي(٨/٣٧٥/٣٧٧) فەرموودەیەکی مونقەتیعە.

لەگەڵ بەستون، هەرکاتێك مردن‌و ماڵێکیان لەدوا بەجێما(با میرات لە یەکتر ببەن) بەشی خۆیان پێ بگات. ئیبنوعەباس‌و موجاهدو سەعیدی کوڕی جوبەیرو ئەبو سالح‌و قەتادەو زەیدی کوڕی ئەسلەم‌و سوددی‌و زەحاك‌و موقاتیلی کوڕی حەیان‌و کەسانی تریش دەڵێن: مەبەست بە(الموالی) میراتگرە[1] ئیبنو عەبباس وتی: کەس‌و کاری باوکە(عصبە). ئیبنو جەریر وتی: عەرەبەکان بە کوڕی مامیان وتووە(مولی) وە مەبەست بە ئەم دەقە کە دەفەرمووێت: ﴿مِمَّا تَرَكَ الْوَالِدَانِ وَالْأَقْرَبُونَ﴾ لەو ماڵەی باوك‌و دایك‌و خزمە نزیکەکانی بەجێیان هێشتووە بۆیان، مانای دەقەکە ئەوەیە: ئەی خەڵکینە بۆ هەرکەسێك لە ئێوە کەس‌و کارێکمان داناوە کە بەشیان هەیە لەو ماڵەی باوك‌و دایك‌و خزمە نزیکەکانی لە میراتەکەیدا. وە خودای گەورە دەفەرمووێت: ﴿وَالَّذِينَ عَقَدَتْ أَيْمَانُكُمْ فَآتُوهُمْ نَصِيبَهُمْ﴾ واتە: ئەوانەش هاوپەیمانیتان لەگەڵ بەستوون‌و بەڵێنتان پێداون، ئێوەش‌و ئەوانیش بەشی خۆیان بدەنێت لە میرات، وەك چۆن بەڵێنتان پێداون‌و سوێندتان لەسەر خواردووە. خودا شایەتە لە نێوانتاندا لە سەر ئەو بەڵێن‌و پەیمانانە کە داوتانە. ئەمە لە سەرەتای هاتنی ئاینی ئیسلامدا بوو، پاشان نەسخ کرایەوەو فەرماندرا کە سەر ڕاستبن لەهەر شتێکدا کە پەیمانیان لەسەری بەستوەو دوای هاتنە خوارەوەی ئەم ئایەتە ئیتر پەیمانی تازە نەبەستن. بوخاری ڕیوایەتی کردووە لە ئیبنو عەبباسەوە ﴿وَلِكُلٍّ جَعَلْنَا مَوَالِيَ﴾ وتی: کەس‌و کارە. ﴿وَالَّذِينَ عَقَدَتْ أَيْمَانُكُمْ﴾ کاتێك کە کۆچەریەکان هاتنە مەدینە کۆچەریەکان میراتیان لە ئەنساریەکان دەبرد، جگە لە خزمەکان. بەپێی ئەو برایەتیەی کە پێغەمبەر(ﷺ) خستیە نێوانیان کاتێك ئەم ئایەتە هاتە خوارەوە ﴿وَلِكُلٍّ جَعَلْنَا مَوَالِيَ﴾ نەسخ بووەوە پاشان خودای گەورە فەرمووی: ﴿وَالَّذِينَ عَقَدَتْ أَيْمَانُكُمْ فَآتُوهُمْ نَصِيبَهُمْ﴾ واتە: لە یارمەتیدان‌و ئامۆژگاری کردن‌و پێویستی دەرکردنیان. میراتگری نەما، بەڵکو وەسیەتی بۆ دەکرا[2]﴿إِنَّ اللَّهَ كَانَ عَلَىٰ كُلِّ شَيْءٍ شَهِيدًا﴾ خودا لەسەر هەموو شتێك ئاگادارە.

﴿الرِّجَالُ قَوَّامُونَ عَلَى النِّسَاءِ بِمَا فَضَّلَ اللَّهُ بَعْضَهُمْ عَلَىٰ بَعْضٍ وَبِمَا أَنفَقُوا مِنْ أَمْوَالِهِمْ ۚ فَالصَّالِحَاتُ قَانِتَاتٌ حَافِظَاتٌ لِّلْغَيْبِ بِمَا حَفِظَ اللَّهُ ۚ وَاللَّاتِي تَخَافُونَ نُشُوزَهُنَّ فَعِظُوهُنَّ

---

[1] الطبري(٨/٢٧٠/٢٧١).

[2] فتح الباری(١/٩٦).

وَٱهْجُرُوهُنَّ فِى ٱلْمَضَاجِعِ وَٱضْرِبُوهُنَّ فَإِنْ أَطَعْنَكُمْ فَلَا تَبْغُوا۟ عَلَيْهِنَّ سَبِيلًا إِنَّ ٱللَّهَ كَانَ عَلِيًّا كَبِيرًا ﴿٣٤﴾

خودای مەزن دەفەرموویت: ﴿ٱلرِّجَالُ قَوَّٰمُونَ عَلَى ٱلنِّسَآءِ﴾ پیاوان بەسەر ژناندا دەستەڵاتیان هەیە. واتە: پیاو کاربەدەستی ئافرەتە، ئەو گەورەو کاربەدەستو سەرپەرستی کەریەتیو مۆچیاری دەکات کاتێك خواروخێچی کرد. ﴿بِمَا فَضَّلَ ٱللَّهُ بَعْضَهُمْ عَلَىٰ بَعْضٍ﴾ کە خودا هەندێکی لە هەندێکی بەتواناترو گەورەتر بەدی هێناوە. واتە: پیاوان چاکترن لە ژنان، بەرێزتریشن. هەر لەبەرئەوەیە پێغەمبەریەتی تایبەتکراوە بە پیاوەکانەوەو فەرمانڕەواش هەر تایبەتکراوە بە پیاوانەوە بەپێی ئەم فەرموودەیە کە پێغەمبەر(ﷺ) فەرموویەتی:(ئەو گەلە سەرکەوتو نابێت کە ئافرەتانیان کردوەتە سەرۆكو کاربەدەستی خۆیان) بوخاری ڕیوایەتی کردووە.[1] وە هەر بەو شێوەیە پلەو پایەی دادوەریشی (القضاء) پێ نادرێت ﴿بَعْضٍ وَبِمَآ أَنفَقُوا۟ مِنْ أَمْوَٰلِهِمْ﴾ دیارە پیاوان ئەرکی بەڕێکردنی ماڵیان لەسەر شانە. واتە: لە مارەیی‌و بژێوی‌و ئەو مەرجانەی کە خودا دایناوە لەسەر پیاوان بۆ ژنان وەك لە قورئان‌و فەرموودەکانی پێغەمبەریشدا(ﷺ) هاتووە. کەواتە پیاو لە ژن بەڕێزترەو خاوەنی ڕێزە بەسەر ژنەوە. ئەم ڕێزەش هەڵدەگرێت کە خاوەن دەستەڵات بێت بەسەریدا. وەك خودای گەورە دەفەرموێت: ﴿و للرجال علیهن درجة﴾[2] پیاوان پلەیەکیان هەیە بەسەر ژنانەوە.

## نیشانەی ژنی چاك

خودای مەزن دەفەرموێت: ﴿فَٱلصَّٰلِحَٰتُ قَٰنِتَٰتٌ حَٰفِظَٰتٌ لِّلْغَيْبِ بِمَا حَفِظَ ٱللَّهُ﴾ ژنانی باش ئەوانەن کە گوێڕایەڵن‌و(وەك خودا فەرمانیداوە) دوور لە مێردیان شەرمی خۆیان دەپارێزن ئاگاداری سامانی هاوسەرەکانیانن. ئیبنو عەباس‌و کەسانی تریش دەڵێن: ئەو ژنانەی گوێڕایەڵی هاوسەرەکانیانن.[3] ﴿حَٰفِظَٰتٌ لِّلْغَيْبِ﴾ سوددی‌و کەسانی تریش وتیان: ئەو ژنەیە دوور لە هاوسەرەکەی شەرمی خۆی‌و ماڵی هاوسەرەکەی دەپارێزێت ﴿بِمَا حَفِظَ ٱللَّهُ﴾ لەبەرئەوەی خودا فەرمانی پاراستنی داوە. پارێزراویش ئەوەیە کە خودا پاراستوویەتی[4] ئیبنو جەریر ڕیوایەتی کردووە لە ئەبوهورەیرەوە وتی: پێغەمبەری خودا(ﷺ) فەرموویەتی:(باشترین ژن ژنێکە کاتێك کە بۆت ڕوانی

---

[1] فتح الباری (٧/٧٣٢).

[2]

[3] الطبري(٨/٢٩٤).

[4] الطبري(٨/٢٩٥).

دڵخۆشت بکات، وە کاتێك فەرمانت پێکرد گوێڕایەلیت بکات، وەکاتێك کە دووری لێی پارێزگاری لە داوێنی خۆیی‌و ماڵ‌وسامانت بکات) وتی: پێغەمبەری خودا(ﷺ) ئەم ئایەتەی خوێندەوە ﴿ٱلرِّجَالُ قَوَّٰمُونَ عَلَى ٱلنِّسَآءِ﴾ هەتا کۆتایی ئایەتەکە[1] ئیمامی ئەحمەد ڕیوایەتی کردووە لە عەبدوڕەحمانی کوڕی عەوفەوە وتی: پێغەمبەری خودا(ﷺ) فەرموویەتی:(ئەگەر ئافرەت پێنج نوێژەکەی کردو مانگەکە ڕۆژوی گرت(مانگی ڕەمەزان) داوێنی خۆی پاراست‌و گوێڕایەلی هاوسەرەکەی خۆی کرد، پێی دەوترێت: برۆ بەهەشت لە هەر دەرگایەکیەوە کە ئارەزوت لێیەتی)[2].

**سەرپێچی ژن‌و چارەسەری**

خودای گەورە دەفەرموێت: ﴿وَٱلَّٰتِي تَخَافُونَ نُشُوزَهُنَّ﴾ ئەو ژنانەی لە یاخی بوونیان دەترسن. واتە: ئەو ژنانەی لە یاخی بوونیان دەترسن بەرامبەر هاوسەرەکانیان.(النشوز) بریتیە لە بەربوونەوە(المرءة الناشزة) واتە:ئەو ژنەی سەرپێچی لە فەرمانی هاوسەرەکەی دەکات‌و لە فەرمانی دەردەچێت، ڕقی لە هاوسەرەکەیەتی‌و گوێی پێ نادات. هەرکاتێك ئەم نیشانانەی تیا دەرکەوت با ئامۆژگاری بکات‌و بیترسێنێت لە سزای خودا لەسەر ئەو سەرپێچی کردنەی، بۆی ڕوون بکاتەوە کە خودا هەقی مێردو گوێڕایەلی کردنی فەرزکردووەو سەرپێچی کردنی حەرام کردووە، لەسەر ئەو چاکەو پیاوەتیانەی کە هەیەتی بەسەر ژنەکەیدا، وەك پێغەمبەری خودا(ﷺ) فەرموویەتی:(ئەگەر من فەرمانم بدایە کەسێك سوجدە بەرێت بۆ کەسێك، فەرمانم دەدا کە ژن سوجدە ببات بۆ هاوسەرەکەی، کە گەورەترین هەقیەتی بەسەریەوە)[3] بوخاری ڕیوایەتی کردووە لە ئەبوهورەیرەوە(ڕەزای خودای لێ بێت) وتی: پێغەمبەری خودا(ﷺ) فەرموویەتی:(ئەگەر مێرد داوای لە ژنەکەی کردو ئەویش ملی نەدا، مێردەکە بە توڕەییەوە سەری نایەوە، فریشتەکان تا بەرەبەیان نەفرین لەو ئافرەتە دەکەن)[4]موسلیمش ڕیوایەتی کردووە بەم شێوە:(ئەگەر ئەو ژنە خۆی دوورگرت لەسەر جێگەی مێردەکەی فریشتەکان تا بەرەبەریان نەفرینی لێدەکەن)[5] هەر بۆیە خودای گەورە فەرموویەتی: ﴿وَٱلَّٰتِي تَخَافُونَ نُشُوزَهُنَّ فَعِظُوهُنَّ﴾ ئەو ژنانەی لەسەرپێچیان دەترسن ئامۆژگاریان بکەن. پاشان خودای گەورە دەفەرموێت: ﴿وَٱهْجُرُوهُنَّ فِي ٱلْمَضَاجِعِ﴾ جێگەیان لێ جیابکەنەوە. عەلی کوڕی

---

[1] الطبري(٢٩٥/٨).

[2] أحمد(١٩١/١).

[3] تحفة الاحوذي(٣٢٣/٤) فەرموودەیەکی سەحیحە.

[4] فتح الباری(٢٠٥/٩).

[5] مسلم(١٠٥٩/٢).

ئەبو تەلحە لە ئیبنو عەباسەوە وتی: مەبەست بە جێگەجیاکردنەوە، واتە: کاری سەرجێگەی لەگەڵدا نەکات لەگەڵی بخەوێت‌و پشتی لێ هەڵکات.[1] زۆرێك لە زانایان وایان وتوە. سوددیو زەحاكو عیکرەمەو ئیبنو عەباس ئەمەیان لێ زیادکردووە لە ریوایەتێکی تردا: قسەو وتووێژی لەگەڵدا نەکات.[2] لە سونەن‌و موسنەدەکاندا هاتووە لە مەعاویەی کوڕی حەیدەی قوشەیریەوە(حیدة القشیری) کە وتی: ئەی پێغەمبەری خودا(ﷺ) هەقی ژنی هەریەکێك لە ئێمە چیە؟ فەرمووی:(کاتێك خواردنت خوارد خواردنی بدەیتێ، ئەگەر سامانت دەستکەوت پۆشاکی بۆ بکەیت، لەدەم‌وچاوی نەدەیت‌و قسەی ناشیرینی پێ نەڵێیت، لە ماڵدا نەبێت لێی جیانەبیتەوە)[3] وە خودای گەورە دەفەرموێت: ﴿وَاضْرِبُوهُنَّ﴾ لێشیان بدەن. واتە: ئەگەر هەرچاك نەبوو بەئامۆژگاریو جێگە لێ جیاکردنەوە، ئەوکاتە بۆتان هەیە لێیان بدەن. لێدانێك کە شوێنێکی نەشکێت‌و پێوەی دیارنەبێت. وەك لە سەحیحی موسلیمدا هاتووە لە جەریرەوە لە پێغەمبەرەوە(ﷺ) کە لە حەجی ماڵئاواییدا(حج الوداع) فەرموویەتی:(لە خودا بترسن دەربارەی ئافرەتان چونکە بەڕاستی ئەوان ڕاسپاردەن بەلاتانەوە، وە لەسەریانە کەسێك ئێوە پێتان ناخۆشبێت ڕێگەی نەدەن بێتە ماڵتان، ئەگەر وایان کرد لێیان بدەن بە لێدانێکی سوك شوێنیان نەشکێنن‌و ڕۆزیو پۆشاکیان لەسەرتانە بەچاکی)[4] ئیبنو عەباس‌و کەسانی تریش وتویانە: لێدانی سوك‌و شوێنی نەشکێت‌و دیاری نەکات[5]. حەسەنی بەسری وتی: لێدانێك پێوەی دیارنەبێت[6].

## هیچ ڕێگەیەك دژی ئافرەت مەگرنەبەر ئەگەر گوێڕایەڵی کرد

خودای مەزن دەفەرموێت: ﴿فَإِنْ أَطَعْنَكُمْ فَلَا تَبْغُوا عَلَيْهِنَّ سَبِيلًا﴾ ئەگەر گوێڕایەڵیان کردن، ئێوە بیانوی ئازاردانیان بۆ مەدۆزنەوە. واتە: ئەگەر ژن سەرپێچی هاوسەرەکەی نەکرد لە هەرشتێکدا داوای لێکرد لەوشتانەی کە خودا ڕێگەی پێداوە، ئیتر هاوسەرەکەی بە هیچ شێوەیەك بۆی نیە جێگەی لێ جیابکاتەوە. ﴿إِنَّ اللَّهَ كَانَ عَلِيًّا كَبِيرًا﴾ بەڕاستی هەمیشە بەرزو بڵندو گەورەیە. ئەمە هەڕەشەیە لە پیاوان ئەگەر ئازاری ژنان بدەن بەبێ هیچ هۆیەك. بێگومان خودای گەورە خاوەن

---

[1] الطبري(٨/٣٠٢).

[2] الطبري(٨/٣٠٢/٣٠٤).

[3] أبوداود(٢/٦٠٦)، النساء في الكبرى(٥/٣٧٥)، ابن ماجة(١/٥٩٣)، أحمد(٥/٣) فەرموودەیەکی حەسەنە..

[4] مسلم(٨/٨٨٦).

[5] الطبري(٨/٣١٤).

[6] الطبري(٨/٣١٦).

دەسەڵاتو یارمەتی دەری ئەوانەو تۆڵە دەستێنێتو لەو پیاوانەی ناهەقیان پێ دەکاتو ئازاریان دەداتو دەستدرێژی دەکاتە سەریان.

﴿ وَإِنْ خِفْتُمْ شِقَاقَ بَيْنِهِمَا فَابْعَثُوا حَكَمًا مِنْ أَهْلِهِ وَحَكَمًا مِنْ أَهْلِهَا إِن يُرِيدَا إِصْلَاحًا يُوَفِّقِ اللَّهُ بَيْنَهُمَا إِنَّ اللَّهَ كَانَ عَلِيمًا خَبِيرًا (٣٥) ﴾

**ئەگەر ترسان لەوەی کە پیاوو ژنەکە نایانکرێت پێکەوە دوو ناوبژوان دانێن لە نێوانیاندا**

خودای مەزن باسی حاڵەتی یەکەمی کرد، ئەوەبوو کاتێك کە ژنەکە سەرپێچی کردوو ملی نەدا(دەبێت چۆن هەڵسو کەوتی لەگەڵدا بکرێت) پاشان دێتە سەر حاڵەتی دووهەم، ئەوەیە کە ژنو پیاوەکە هەردووکیان پێکەوە نەیاندەکرا درێژە بە ژیانی هاوسەری بدەن. خودای گەورە دەفەرموێت: ﴿ وَإِنْ خِفْتُمْ شِقَاقَ بَيْنِهِمَا فَابْعَثُوا حَكَمًا مِنْ أَهْلِهِ وَحَكَمًا مِنْ أَهْلِهَا ﴾ ئەگەر ترسان کە ژنو پیاوەکە پێکەوە نایانکرێت ناوبژیوانێك لە کەسو کاری پیاوەکەو ناوبژیەانێك لەکەسو کاری ژنەکە. بابینە ناوبژیکەر. زانایانی شەریعە دەڵێن: ئەگەر ناکۆکی کەوتە نێوان ژنو پیاو، دادوەر لە تەنیشت پیاوێکی جێ متمانە نیشتەجێیان دەکات هەتا ئاگای لە هەڵسو کەوتیان بێت، تا هەر کامیان ناهەقی بەوی تریان کرد ڕێگری لەو ناهەقیەی بکات. ئەگەر کارەکەیان بەرەو خراپی دەچوو دژایەتیەکەیان درێژەی کێشا، دادوەر پیاوێکی جێ متمانە لە کەسو کاری ژنەکە دەنێرێت، کەسێکی جێ متمانەش لە کەسو کاری پیاوەکە دەنێرێت، تا کۆببنەوەو سەیری کێشەکەیان بکەنو ئەوەی بە چاکی دەزانن لەبارەیانەوە پێی هەڵدەسن بە جیاکردنەوە یان بەپێك هێنانەوە یان خودا خۆی ئاگاداری ئەو پێك هێنانەوەیە بۆیە دەفەرموێت: ﴿إِن يُرِيدَا إِصْلَاحًا يُوَفِّقِ اللَّهُ بَيْنَهُمَا﴾ هەکاتێك هەردوولا ڕازی بوون پێکەوە بمێننەوە، خودا پێکیان دێنێتەوە. عەلی کوڕی ئەبو تەلحە لە ئیبنو عەبباسەوە وتی: خودای مەزن فەرمانی داوە کە پیاو چاکێك لە کەسوکاری پیاوەکە بنێرنو پیاوێکیش لە کەسوکاری ژنەکەش بنێرن، تا بزانن کامیان تاوانبارن، ئەگەر پیاوەکە تاوانبار بوو ژنەکە لە پیاوەکە دەسێننەوە، ناچاریشی دەکەن کە بژێوی ژنەکە بدات، وە ئەگەر ژنەکە تاوانبار بوو، هەر ژنی پیاوەکەیەتی بژێوی لێ قەدەغە دەکەن. بەڵام ئەگەر هاتنەسەر ئەوەی کە جیایان بکەنەوە لە یەکتری یان پێکیان بخەنەوە. کارەکەیان دروستە، وە ئەگەر بڕیاریان دا پێکیان بێننەوە یەکێکیان ڕازی بوو ئەوی تریان ڕازی نەبوو، ئەگەر یەکێکیان مرد ئەوە ڕازی بووە میراتە لەوە دەبات کە ڕازی نەبووە. بەڵام ئەوەی ڕازی نەبووە میرات نابات لەوەی ڕازی بووە[1] ئیبنو حاتەم ئیبنو جەریر ڕیوایەتیان کردووە.ئەبو عومەر

---

[1] الطبري(٨/٣٢٥).

عەبدولعەزیز(عبدالعزیز) دەڵێت: زانایان کۆدەنگن لەسەرئەوە، ئەگەر دووناوبژیوانەکە لە قسەکانیاندا جیاوازبوون، قسەی یەکێکیان کاری پێناکرێت. وەکۆدەنگن لەسەرئەوە کە قسەکانیان جێبەجێ دەکرێت لە پێکهێنانەوەدا، با پیاوو ژنەکەیش نەیانکردبێت بە وەکیل. بەڵام زانایان ناکۆکن لەسەرئەوە ئایا قسەی ناوبژیوانەکان جێبەجێ دەکرێت لە جیابوونەوەدا؟ پاشان گێڕاویانەتەوە لە زانایانەوە کە قسەی ناوبژیوانەکان جێبەجێ دەکرێت دیسان بێ وەکیلی کردن.

﴿وَٱعۡبُدُواْ ٱللَّهَ وَلَا تُشۡرِكُواْ بِهِۦ شَيۡـٔٗاۖ وَبِٱلۡوَٰلِدَيۡنِ إِحۡسَٰنٗا وَبِذِي ٱلۡقُرۡبَىٰ وَٱلۡيَتَٰمَىٰ وَٱلۡمَسَٰكِينِ وَٱلۡجَارِ ذِي ٱلۡقُرۡبَىٰ وَٱلۡجَارِ ٱلۡجُنُبِ وَٱلصَّاحِبِ بِٱلۡجَنۢبِ وَٱبۡنِ ٱلسَّبِيلِ وَمَا مَلَكَتۡ أَيۡمَٰنُكُمۡۗ إِنَّ ٱللَّهَ لَا يُحِبُّ مَن كَانَ مُخۡتَالٗا فَخُورًا ٣٦﴾

**فەرماندان بە خودا پەرستی و چاکەکردن لەگەڵ دایک و باوکو کەس وکاردا**

خودای مەزن فەرمان دەکات بە عەبدەکانی کە تەنیا ئەو بپەرستن‌و هاوبەشی بۆ دانەنێن، چونکە خودا وەدیهێنەرو ڕۆزی دەرو چاکەی زۆر هەیە بەسەر عەبدەکانیەوە لە هەموو شوێن و لە هەموو کاتێکدا. هەر خودا شایستەی ئەوەیە کە ئەوان بە تەنیا عیبادەتی بکەن لە هیچ شتێکدا هاوبەشی لە دروستکراوەکانیدا بۆ دانەنێن. وەك پێغەمبەری خودا(ﷺ) فەرمووی بە مەعازی کوڕی جەبەل:(ئایا دەزانی هەقی خودا چیە بەسەر بەندەکانیەوە؟) وتی: خوداو پێغەمبەرەکەی باش دەزانن، فەرمووی:(بیپەرستن‌و لە هیچ شتێکدا هاوبەشی بۆدانەنێن). پاشان فەرمووی:(ئایا دەزانی هەقی بەندەکان چیە بەسەر خوداوە ئەگەر ئەوەیان کرد؟ ئەوەیە کە سزایان نەدات)[1] پاشان ڕاسپێری کردووە بە چاکەکردن لەگەڵ دایک‌وباوك، چونکە خودای گەورە بەهۆی ئەوانەوە لە نەبوونەوە تۆی هێناوەتە دونیا. زۆرجار خودای گەورە کەباسی پەرستنی خۆی دەکات لەگەڵی باسی چاکەکردنی کردووە لەگەڵ دایک‌وباوك. وەك دەفەرمووێت: ﴿أَنِ ٱشۡكُرۡ لِي وَلِوَٰلِدَيۡكَ﴾[2] تۆ سوپاسی من بکەو سوپاسی دایک‌وباوکیشت بکەو وە دەفەرمووێت: ﴿وَقَضَىٰ رَبُّكَ أَلَّا تَعۡبُدُوٓاْ إِلَّآ إِيَّاهُ وَبِٱلۡوَٰلِدَيۡنِ إِحۡسَٰنًا﴾[3] پەروەردگارت بڕیاری دا کە جگە لەو مەپەرستن‌و سەبارەت بە دایك‌و باوکیش چاکە بکەن. وە لێرەشدا دەفەرمووێت: ﴿وَٱعۡبُدُواْ ٱللَّهَ وَلَا تُشۡرِكُواْ بِهِۦ شَيۡـٔٗاۖ وَبِٱلۡوَٰلِدَيۡنِ إِحۡسَٰنٗا وَبِذِي ٱلۡقُرۡبَىٰ﴾ عەبدایەتی خودا بکەن‌و هیچ شت مەکەن بە شەریکی، دەربارەی دایك‌و باوك‌و خزمەکان هەتا دەتوانن چاکە بکەن،

---

[1] فتح الباری(١٣/٣٥٩).

[2] لقمان(١٤) .

[3] الاسراء(٢٣).

لێرەدا کە باسی دایکو باوك دەکات، خزمەکانیش بەدوادادێنێت. وە لە فەرموودەشدا هاتووە(بەخشین بە هەژاران سەدەقەیە، بە خزمانیش سەدەقەیەو پەیوەندی خزمایەتی بەجێ هێنانیشە)[1] پاشان خودای گەورە دەفەرمووێت: ﴿وَٱلۡيَتَٰمَىٰ﴾ هەتیوان، چونکە هەتیوان دایكو باوکیان لەدەست چووە تا بەرژەوەندیەکانیان بۆ جێبەجێ بکەنو خەرجیان بدەن، بۆیە خودای مەزن فەرمانی داوە بە چاکەکردن لەگەڵیانو سۆزدەربڕین بۆیان. پاشان دەفەرمووێت: ﴿وَٱلۡمَسَٰكِينِ﴾ هەژاران، ئەو کەم دەستانەن کە ئەوەندەیان نیە بەشیان بکات، خودای گەورە فەرمانی داوە کە هاوکاری بکرێن بەپێی پێویست بۆ ئەوەی لەو تەنگانەیە دەربچن.

## هەقی هاوسێ[2]

خودای مەزن دەفەرمووێت: ﴿وَٱلۡجَارِ ذِى ٱلۡقُرۡبَىٰ وَٱلۡجَارِ ٱلۡجُنُبِ﴾ هاوسێی دیوار بەدیوارو هاوسێی دوور. عەلی کوڕی ئەبو تەلحە لە ئیبنو عەباسەوە وتی: ﴿وَٱلۡجَارِ ذِى ٱلۡقُرۡبَىٰ﴾ ئەو هاوسێیەی لە نێوان تۆو ئەودا خزمایەتی هەیە[2] ﴿وَٱلۡجَارِ ٱلۡجُنُبِ﴾ ئەو هاوسێیەی لە نێوان تۆو ئەودا خزمایەتی نیە[3] هەر بەم شێوە ڕیوایەتی کردووە لە عیکرەمەو موجاهدو مەیمونی کوڕی مەهرانو زەحاكو زەیدی کوڕی ئەسلەمو موقاتیلی کوڕی حەیانو قەتادەوە.[4] دیسان موجاهد لەم دەقەدا کە خودای گەورە دەفەرمووێت: ﴿وَٱلۡجَارِ ٱلۡجُنُبِ﴾ وتی: واتە هاوەڵ لە سەفەردا[5] فەرموودە لەبارەی هاوسێوە زۆرە کە ئامۆژگاری داوە دەربارەی هاوسێ بەیارمەتی خودا هەندێکی باس دەکەین.

### فەرموودەی یەکەم

ئیمامی ئەحمەد ڕیوایەتی کردووە لە عەبدوڵلای کوڕی عومەرەوە(ڕەزای خودای لێ بێت) پێغەمبەری خودا فەرموویەتی:(بەردەوام جوبرەئیل ئامۆژگای دەکردم دەربارەی چاکەکردن لەگەڵ هاوسێدا هەتا وامزانی هاوسێ میرات لە هاوسێ دەبات)[6] لە هەردوو سەحیحەکەشدا هاتووە[7].

---

[1] تحفة الاحوذي(٣/٣٢٤) فەرموودەیەکی حەسەنە.

[2] الطبري(٨/٣٣٥).

[3] الطبري(٨/٣٣٨).

[4] الطبري(٨/٣٣٥/٣٣٦).

[5] الطبري(٨/٣٤١).

[6] أحمد(٢/٨٥) فەرموودەیەکی سەحیحە.

[7] فتح الباري(١٠/٤٥٥)، مسلم(٤/٢٠٢٥).

**فەرموودەی دووەم**

دیسان ئیمامی ئەحمەد ڕیوایەتی کردووە لە عەبدوڵڵای کوڕی عەمری کوڕی عاسەوە لە پێغەمبەری خوداوە(ﷺ) فەرمەوویەتی:(بەردەوام جوبرەئیل ئاگاداری دەکردم دەربارەی چاکەکردن لەگەڵ هاوسێدا، هەتا وامزانی هاوسێ میرات لە هاوسێ دەبات)[1] ئەبوداودو تیرمیزی هەر بەم شێوەیە ڕیوایەتیان کردووە، تیرمیزی وتی فەرموودەیەکی حەسەنی غەریبە بەم شێوەیە[2].

**فەرموودەی سێهەم**

دیسان لە ئیمامی ئەحمەد ڕیوایەتی کردووە لە عەبدوڵڵای کوڕی عەمری کوڕی عاسەوە لە پێغەمبەری خوداوە(ﷺ) ڕیوایەتکراوە:(چاکترین هاوەڵ لەلای خودا ئەوەیە چاکترینیانە بۆ هاوەڵەکەی، وە چاکترین هاوسێ لەلای خودا چاکترینیانە بۆ هاوسێیەکەی)[3] تیرمیزیش ڕیوایەتی کردووە و وتی: فەرموودەیەکی حەسەنو غەریبە[4].

**فەرموودەی چوارەم**

ئیمامی ئەحمەدڕیوایەتی کردووە لەمیقدادی کوڕی ئەسوەدەوە وتی: پێغەمبەری خودا(ﷺ) فەرمووی بە هاوەڵەکان:(چی دەڵێن دەربارەی داوێن پیسی؟) وتیان: حەرامە، خوداو پێغەمبەرەکەی حەرامیان کردووە. ئەوە حەرامە هەتا ڕۆژی قیامەت. پێغەمبەری خودا(ﷺ) فەرمووی:(ئەگەر پیاوێك داوێن پیسی بکات لەگەڵ دە ژندا سوکو ئاسانترە لەوەی کە داوێن پیسی بکات لەگەڵ هاوسێکەیدا)، فەرمووی:(چی دەڵێن لە بارەی دزیەوە؟)وتیان خوداو پێغەمبەرەکەی حەرامی کردووە،ئەوە حەرامە. فەرمووی:(ئەگەر پیاوێك دزی بکات لەماڵ سوکو ئاساترە لەوەی کە دزی لە هاوسێکەی بکات)[5] تەنیا ئیمامی ئەحمەد هێناویێتی بەڵام نمونەی هەیە لە هەردوو سەحیحەکەدا لە فەرموودەکەی ئیبنو مەسعودەوە، وتم: ئەی پێغەمبەری خودا(ﷺ) چ گوناهێك گەورەترە؟ فەرمووی:(هاوبەش بۆ خودا دابنێیت کە ئەو دروستی کردوی) وتم: پاشان چی تر؟ فەرمووی:(منداڵەکەی خۆت بکوژی لە ترسی ئەوەی خواردنت لەگەڵ بخوات) وتم: پاشان چی تر؟ فەرمووی:(داوێن پیسی لەگەڵ ژنی هاوسێکەتدا بکەیت)[6].

---

[1] أحمد(٢/١٦٠) فەرموودەیەکی سەحیحە.

[2] أبوداود(٥/٣٧٥)، تحفة الاحوذي(٦/٧٢/٧٣) فەرموودەیەکی حەسەنە.

[3] أحمد(٢/١٦٧) فەرموودەیەکی باشە(جید)

[4] تحفة الاحوذي(٦/٧٥).

[5] أحمد(٦/٨) فەرموودەیەکی لاوازە.

[6] فتح الباری(٨/٣٥٠)، مسلم(١/٩٠).

### فەرموودەی پێنجەم

ئیمامی ئەحمەد ڕیوایەتی کردووە لە عائیشەوە(ڕەزای خودای لێ بێت) کە پرسیاری کردووە لە پێغەمبەری خودا(ﷺ) وتویەتی: دوو هاوڕێم هەیە بۆ کامیان دیاری بنێرم؟ فەرمووی: (ئەوەیان دەرگایەکەی زیاتر لێتەوە نزیکە) بوخاریش ڕیوایەتی کردووە.[1]

### فەرماندان بە چاکەکردن دەربارەی ئەوانەی کە بوونەتە موڵکتان

خودای مەزن دەفەرموێت: ﴿وَمَا مَلَكَتۡ أَيۡمَـٰنُكُمۡ﴾ ئەوانەی بوونەتە ماڵتان. ئەمە ڕاسپاردەیە دەربارەی کۆیلەکان، چونکە کۆیلە لاوازو بێ دەسەلاتو یەخسیری دەستی خەڵکە، هەر بۆیە لە پێغەمبەرەوە(ﷺ) ڕیوایەت کراوە کە لەو نەخۆشیەی کۆچی دوایی تیا کردو ئامۆژگاری ئومەتوکەی دەکردو دەیفەرموو:(نوێژەکان نوێژەکان وە ئەوانەی بوونەتە ماڵتان) هەر دەیوتەوە لەسەر زمانی لاینەدەبرد[2] هەمیشە لەسەر زمانی بووە. ئیمامی ئەحمەد ڕیوایەتی کردووەلە میقدادی کوڕی مەعدی یەکریبەوە(معدیکریب) وتی: پێغەمبەری خودا(ﷺ) فەرموویەتی:(ئەوخواردنەی خۆت خواردووتە، ئەو خواردنەی داوتە بە منداڵەکەت ئەوە سەدەقەیە بۆت، ئەو خواردنەی داوتە بە هاوسەرەکەت، ئەوە سەدەقەیە بۆت، ئەو خواردنەی داوتە بە خزمەتکارەکەت، سەدەقەیە بۆت)[3] نەسائیش ڕیوایەتی کردووە بە سەنەدێکی ڕاست.[4] لە عەبدوڵڵای کوڕی عەمرەوە کە وتویەتی بە قارەمانێکی خۆی(قهرمان): کەسێکە هەڵدەستێت بە کاروباری بازرگانی گەورەکەی‌و بەردەستیشی دەکات ئایا خۆراکت داوە بە بەندەکان؟ وتی: نەخێر، وتی: هەڵسە بچۆ پێیان بدە، چونکە پێغەمبەری خودا(ﷺ) فەرموویەتی:(بەسە بۆ تاوانباری کەسێك ئەوانەی لە ژێر دەستەلاتیدایە بگرێتەوە)[5] موسلیم ڕیوایەتی کردووە. ئەبوهورەیرە وتی: پێغەمبەری خودا(ﷺ) فەرموویەتی: (ئەوەی لەژێر دەستاندایە خۆراك‌و پۆشاکی لەسەرتانەو کارێکی وایش بەسەردا نادرێت کە لە توانایدا نەبێت)[6] دیسان موسلیم ڕیوایەتی لە ئەبوهورەیرەوە لە پێغەمبەرەوە(ﷺ) فەرموویەتی:(ئەگەر یەکێك لە ئێوە خزمەتکارەکەی خواردنی بۆ هێنا، ئەگەر لەگەڵ خۆیشی داینەنا، با تیکەیەك یان دوو تیکەی بداتێت، گەرمی ئاگرەکەی‌و

---

[1] أحمد(٦/١٥٧)، البخاری(٦٠٢٠) فەرموودەیەکی سەحیحە.

[2] النسائي في الكبرى(٤/٢٥٨) فەرموودەیەکی سەحیحە.

[3] أحمد(٤/١٣١) فەرموودەیەکی سەحیحە.

[4] النسائي في الكبرى(٥/٣٧٦) فەرموودەیەکی سەحیحە.

[5] مسلم(٢/٦٩٢).

[6] مسلم(٣/١٢٤٨).

دووکەڵەکەی بەسەرداچوەو زەحمەتی لەگەڵدا کێشاوە) بوخاریو موسلیم ڕیوایەتیان کردووە.[1] وتەکە هی بوخاریە.

## خودا خۆشی لە لوتبەرزان نایەت

خودای مەزن دەفەرمووێت: ﴿إِنَّ اللَّهَ لَا يُحِبُّ مَن كَانَ مُخْتَالًا فَخُورًا﴾ ئەوکەسانەی لوت بەرز و خۆپەسەندن خودا هیچ کامی خۆشناوێن. واتە: خودا ئەوکەسانەی خۆشناوێت خۆپەسەندن و خۆیان بە زل دەزانن لە ناو خەڵکیدا خۆیان بە چاکتر دادەنێن لەوان. ئەوکەسە لەلای خۆی گەورەیە، لەلای خودا سوكو ڕیسوایەو خەڵکی زۆر ڕقیان لێیەتی. موجاهد لەم دەقەدا کە خودای گەورە دەفەرمووێت: ﴿إِنَّ اللَّهَ لَا يُحِبُّ مَن كَانَ مُخْتَالًا فَخُورًا﴾ واتە: خۆ بەزل زانەو خۆی هەڵدەبرێت بەوەی خودا پێی داوەو سوپاسی خودای لەسەرناکات،[2] زۆر کەم دەزانێت بەوەی کە پێی داوە. ئیبنو جەریر ڕیوایەتی کردووە لە عەبدوڵلای کوڕی واقیدەوە ئەبوڕەجائی هەرەوی وتی: هیچ ئاکار خراپێکت دەست ناکەوێت مەگین کە دەیبینی خۆپەسەندو خۆبەزلزانە. پاشان ئەم ئایەتەی خوێندەوە: ﴿وَمَا مَلَكَتْ أَيْمَانُكُمْ﴾ ئەوانەی بوونەتە مولكتان. کەسێکیش نابینن ئازاری دایكو باوکی بدات مەگین ملهوڕو یاخیە ئەم ئایەتەی خوێندەوە: ﴿وَبَرًّا بِوَالِدَتِي وَلَمْ يَجْعَلْنِي جَبَّارًا شَقِيًّا﴾[3] گوێ لە مستی دایکم بم. نەشی کردووم بە ملهوڕێکی یاخی. وە لە هوجەیمیەوە(الهجیمی)(او بلهجیم) وتی: وتم ئەی پێغەمبەری خودا(ﷺ) ئامۆژگاریم بکە، فەرمووی:(نەکەی پۆشاکەکانتان درێژو شۆڕ بکەنەوە، چونکە درێژکردنەوەی پۆشاك لە خۆپەسەندیەوە بێگومان خودا خۆپەسەندی خۆشناوێت)[4](المخیلە) واتە: لەخۆباییو خۆبەزلزان.

﴿الَّذِينَ يَبْخَلُونَ وَيَأْمُرُونَ النَّاسَ بِالْبُخْلِ وَيَكْتُمُونَ مَا آتَاهُمُ اللَّهُ مِن فَضْلِهِ ۗ وَأَعْتَدْنَا لِلْكَافِرِينَ عَذَابًا مُّهِينًا ﴿٣٧﴾ وَالَّذِينَ يُنفِقُونَ أَمْوَالَهُمْ رِئَاءَ النَّاسِ وَلَا يُؤْمِنُونَ بِاللَّهِ وَلَا بِالْيَوْمِ الْآخِرِ ۗ وَمَن يَكُنِ الشَّيْطَانُ لَهُ قَرِينًا فَسَاءَ قَرِينًا ﴿٣٨﴾ وَمَاذَا عَلَيْهِمْ لَوْ آمَنُوا بِاللَّهِ وَالْيَوْمِ الْآخِرِ وَأَنفَقُوا مِمَّا رَزَقَهُمُ اللَّهُ ۚ وَكَانَ اللَّهُ بِهِمْ عَلِيمًا ﴿٣٩﴾﴾

---

[1] فتح الباری(٥/٢١٤)، مسلم(٣/١٢٨٤).

[2] الطبری(٨/٣٥٠).

[3] مریم(٣٢).

[4] أحمد(٥/٦٤) سەنەدەکانی سەحیحە.

## زەمی ڕژدو پیسکە

خودای مەزن زەمی ئەوکەسانە دەکات کە ڕژدی‌و پیسکەیی لە ماڵ‌و سامانیان دەکەن‌و لەو شتانەدا خەرجی ناکەن کە خودا فەرمانی پێکردوون. وەك چاکەکردن‌و خەرجکردنی بۆ دایك‌و باوك‌و کەس‌وکارو هەژاران‌و هاوسێی نزیك‌و دوورو هاوەڵی هەمیشەیی‌و ڕێبوارو ئەوانەی دەکەونە ژێر دەستیان. هەقی خودایشی لێ دەرناکەن‌و هانی خەڵکیش دەدەن بۆ ڕژدی‌و پیسکەیی. پێغەمبەری خودا(ﷺ) فەرموویەتی:(چ دەردێك لە دەردی نەخۆشی پیسکەیی خراپترە)[1] وە فەرموویەتی:(نەکەن چروك بن، چونکە ئەو دەردە زۆرێکی لە پێش ئێوە لەناوبرد، وە هانی دان بۆ خراپەکاری ئەوانیش کردیان)[2] وە لێرەدا خودای گەورە دەفەرمووێت: ﴿ٱلَّذِينَ يَبۡخَلُونَ وَيَأۡمُرُونَ ٱلنَّاسَ بِٱلۡبُخۡلِ وَيَكۡتُمُونَ مَآ ءَاتَىٰهُمُ ٱللَّهُ مِن فَضۡلِهِۦ﴾ ئەوکەسانەی چروکی دەکەنە پیشەو خەڵکیش بۆ ڕژدی هاندەدەن، ئەو بەشەی خودا پێی داون دەیشارنەوە. چروکی‌و ڕژدی حاشاکردنە لەو بەهرانەی خودا داوێتی، چونکە هیچ نیشانەو شوێنەوارێکی دەرناکەوێت بەوکەسەوە، نە لە خواردن‌و خواردنەوەو نە لە پۆشاك‌و جل‌وبەرگداو نە لە بەخشین‌و یارمەتیدانی خەڵکیدا. وەك خودای گەورە لەم ئایەتەدا دەفەرمووێت: ﴿إِنَّ ٱلۡإِنسَٰنَ لِرَبِّهِۦ لَكَنُودٞ ٦ وَإِنَّهُۥ عَلَىٰ ذَٰلِكَ لَشَهِيدٞ ٧ وَإِنَّهُۥ لِحُبِّ ٱلۡخَيۡرِ لَشَدِيدٌ﴾[3] بەڕاستی مرۆڤ لە ئاستی پەروەردگاری خۆی پێنەزانە(سپڵەیە)، خۆشی باش ئەمە دەزانێت، زۆر حەزی لە ماڵ‌و سامانە. وە لێرەشدا دەفەرمووێت: ﴿وَيَكۡتُمُونَ مَآ ءَاتَىٰهُمُ ٱللَّهُ مِن فَضۡلِهِۦ﴾ ئەو بەشەی خودا پێی داون دەیشارنەوە. بۆیە هەڕەشەیان لێ دەکات‌و دەفەرمووێت: ﴿وَأَعۡتَدۡنَا لِلۡكَٰفِرِينَ عَذَابٗا مُّهِينٗا﴾ با بزانن کە ئێمە بۆ خودانەناسان ئابڕووبەرمان ئامادەکردووە.(الكفر) بریتیە لە شاردنەوەو داپۆشین، کەسی چروك‌و پیسکە بەهرەکانی خودا دەشارێتەوەو حاشای لێ دەکات‌و دایدەپۆشێت. پێ نەزان‌و سپڵەیە بەرامبەر ئەو چاکانەی کە خودا لەگەڵی کردووە. وە لەم فەرموودەیەدا هاتووە:(کاتێك خودای گەورە بەهرەیەك لە بەهرەکانی دەربارەی هەر بەندەیەك دەکات پێی خۆشە نیشانەکانی تێدا دەرکەوێت)[4] هەندێك لە زانایانی پێشینە ئەم ئایەتانەیان کردووەتە بەڵگە لەسەر چروکی و ڕژدی جولەکەکان لە دەرنەخستنی ئەو زانیاریەی لەلایانە لەبارەی سیفەتی

---

[1] الادب المفرد(٨٣) فەرموودەیەکی حەسەنە.

[2] أبوداود(٢/٣٢٤) فەرموودەیەکی سەحیحە.

[3] العاديات(٦- ٨).

[4] الصبرانی الكبير(١٨/١٣٥) فەرموودەیەکی باشە(جید)

پێغەمبەرەوە(ﷺ) و شاردنەوەی ئەو سیفەتانە. بێگومان ئەم ئایەتە ئەوەش هەڵدەگرێت. دەقی ئایەتەکەدیارە کە مەبەست پێی چروکی‌و ڕژدیە لە ماڵ‌و ساماندا. هەرچەندە چروکی‌و ڕژدی لە زانیاریدا باشتر دەگرێتەخۆی. دەقی ئایەتەکە دەربارەی بەخشینە بۆ کەس‌وکارو لاوازو کەم دەستەکان ئەم ئایەتەش کە لە دوایەوە دێت هەر باسی بەخشینی ماڵ‌و سامان ئەکات کە دەفەرموویت: ﴿وَٱلَّذِينَ يُنفِقُونَ أَمْوَٰلَهُمْ رِئَآءَ ٱلنَّاسِ﴾ ئەوکەسانەش بۆ ڕوبینی لەخەڵکی ماڵی خۆیان دەبەخشن. خودای گەورە ئەوانەی نابەخشن‌و دەست قوچاون بە ڕژدو چروك ناو هێناون ئەوانەش دەبەخشن‌و ڕیابازی‌و مەبەستیان لەو بەخشینەدا ناوشۆرەتەو بۆئەوەی خەڵکی بڵێن بەخشندەیە. مەبەستیان ڕەزای خودا نیە لەو بەخشینەدا. لەو فەرموودەی کە باسی ئەو سێ کەسە دەکات کە یەکەمین ئاگری جەهەننەمیان پێ هەڵدەگیرسێنرێت ئەو زاناو غەزاکەرو ماڵ بەخشاندن کە ڕیابازبوون لە ئاکاریاندا(خاوەن ماڵەکە دەڵێت: هیچ شتێکم نەهێشتەوە تۆ پێت خۆش بێت ماڵی تیا ببەخشرێت مەگین لە ڕێگەی تۆ بەخشیومە، خوداش دەفەرموویت: درۆت کرد، بەڵکو مەبەستت ئەوەبوو پێت بڵێن بەخشندەیە. وترا)[1] بۆیە خودای گەورە فەرموویەتی: ﴿وَلَا يُؤْمِنُونَ بِٱللَّهِ وَلَا بِٱلْيَوْمِ ٱلْـَٔاخِرِ﴾ باوەڕیان بە خوداو ڕۆژی قیامەت نیە، واتە: ئەوەی وای لێکردن کە هەڵسن بەو کارە خراپ‌و بەدانەو لایدان‌و ترازاندنی لە گوێڕایەڵی فەرمانی خودا شەیتان بوون کە فریوی داون‌و پێی بۆ خۆش کردون‌و ئەو کارە خراپانەی لەلا جوان کردن. ﴿وَمَن يَكُنِ ٱلشَّيْطَٰنُ لَهُۥ قَرِينًا فَسَآءَ قَرِينًا﴾ هەر کەسێکیش شەیتان هاوڕێی بێت، خراپترین هاوڕێی هەیە. پاشان خودای گەورە دەفەرموویت: ﴿وَمَاذَا عَلَيْهِمْ لَوْ ءَامَنُوا۟ بِٱللَّهِ وَٱلْيَوْمِ ٱلْـَٔاخِرِ وَأَنفَقُوا۟ مِمَّا رَزَقَهُمُ ٱللَّهُ﴾ چیان لێدەهات ئەمانە، با باوەڕیان بە خوداو ڕۆژی قیامەت ببوایە ئەوسا لەوماڵەی کە خودا بەشی داون بیانبەخشیایە؟ واتە: چ زیانێکیان لێ دەکەوت ئەگەر بڕوایان بە خودا بووایەو ڕێگەی چاکەیان وەبەربگرتایەو وازیان لە ڕیابازی بهێنایەو ڕێگەی خودناس‌و بڕوا بە خودایان بگرتایەو هیوای پاداشتی ڕۆژی قیامەت بوونایە کە خودا دایناوەو ئامادەی کردووە بۆ ئەوکەسانەی ئاکار چاکن‌و لەو ماڵەی کە خودا پێی داون، بەوجۆرە کە خودا پێی خۆشەو پێی ڕازیە بیانبەخشیایە. ﴿وَكَانَ ٱللَّهُ بِهِمْ عَلِيمًا﴾ خودا بە کاروباری ئەوان باش دەزانێت . واتە: ئاگاداری نیەتی چاك‌و خراپیانە. وە دەشزانێت کێ شایستەی یارمەتیدانە یارمەتی دەدات‌و شارەزایی دەخاتە دڵیەوەو ئاسانکاری بۆ دەکات بۆ ئاکاری چاك‌و بەو هۆیەوە لێی ڕازی دەبێت، کێش

---

[1] النسائي(٦/٢٤) فەرموودەیەکی مەرفوعە.

شایەنی ڕیسوایی‌و دەرکردنە لەلایەن خوداوە، ئەوکەسەش خودا ڕیسوای دەکات‌و ڕەنجەڕۆو ماڵ وێرانە لە دونیاو لە قیامەتدا، پەنا بەخودا لەو ڕەنجەڕۆو ڕیسواییە.

﴿إِنَّ ٱللَّهَ لَا يَظۡلِمُ مِثۡقَالَ ذَرَّةٍۖ وَإِن تَكُ حَسَنَةً يُضَٰعِفۡهَا وَيُؤۡتِ مِن لَّدُنۡهُ أَجۡرًا عَظِيمًا ﴿٤٠﴾ فَكَيۡفَ إِذَا جِئۡنَا مِن كُلِّ أُمَّةِۭ بِشَهِيدٖ وَجِئۡنَا بِكَ عَلَىٰ هَٰٓؤُلَآءِ شَهِيدٗا ﴿٤١﴾ يَوۡمَئِذٖ يَوَدُّ ٱلَّذِينَ كَفَرُواْ وَعَصَوُاْ ٱلرَّسُولَ لَوۡ تُسَوَّىٰ بِهِمُ ٱلۡأَرۡضُ وَلَا يَكۡتُمُونَ ٱللَّهَ حَدِيثٗا ﴿٤٢﴾﴾

**خودا بەئەندازەی گەردیلەیەك ناهەقی لە كەس ناكات**

خودای مەزن باسی ئەوە دەكات كە لە ڕۆژی قیامەتدا ناهەقی بە هیچ عەبدێك لە.عەبدەكانی ناكات بە ئەندازەی تۆوی خەرتەلەیەك یان گەردیلەیەك بەڵكو پاداشتی دەداتەوە، خۆ ئەگەر چاكەی هەبوو بە چەندجار پاداشتی دەداتەوە. دەفەرموویێت: ﴿إِنَّ ٱللَّهَ لَا يَظۡلِمُ مِثۡقَالَ ذَرَّةٍۖ وَإِن تَكُ حَسَنَةً يُضَٰعِفۡهَا﴾ خودا بە سەنگی مێرولەی زەردی وردیلەیش ناهەقی لە هیچ كەس ناكات. بەڵام بەرامبەر بەهەر چاكەیەك بیكەن دوو ئەوەندە پاداشتان دەداتەوە. وەك لە ئایەتێكی تردا دەفەرموویێت: ﴿وَنَضَعُ ٱلۡمَوَٰزِينَ ٱلۡقِسۡطَ لِيَوۡمِ ٱلۡقِيَٰمَةِ فَلَا تُظۡلَمُ نَفۡسٞ شَيۡـٔٗاۖ وَإِن كَانَ مِثۡقَالَ حَبَّةٖ مِّنۡ خَرۡدَلٍ أَتَيۡنَا بِهَاۗ وَكَفَىٰ بِنَا حَٰسِبِينَ﴾[1] ڕۆژی قیامەت چەندین تەرازوی بەرانبەر دەخەینەكار، ئەوسا بەقەد سەنگی تۆمی وردیلەی دانە خەردەلێكیش دەخەینەڕو، ناهەقی لە كەس ناكرێت،ئەوسا بەسە هەر خۆمان هەژماریان بۆ بكەین. وە خودای مەزن لەسەر زمانی لوقمان فەرموویەتی: ﴿يَٰبُنَيَّ إِنَّهَآ إِن تَكُ مِثۡقَالَ حَبَّةٖ مِّنۡ خَرۡدَلٖ فَتَكُن فِي صَخۡرَةٍ أَوۡ فِي ٱلسَّمَٰوَٰتِ أَوۡ فِي ٱلۡأَرۡضِ يَأۡتِ بِهَا ٱللَّهُ﴾[2] كوڕەكەی خۆم، كردەی بە ئەندازەی تۆمی خەردەلێك لە ناو ئاسمانەكان یان لەسەر زەمین لەناو بەردێك بێت، خودا دەیهێنێتەڕوو. وە دەفەرموویێت: ﴿فَمَن يَعۡمَلۡ مِثۡقَالَ ذَرَّةٍ خَيۡرٗا يَرَهُۥ ﴿٧﴾ وَمَن يَعۡمَلۡ مِثۡقَالَ ذَرَّةٖ شَرّٗا يَرَهُۥ﴾[3] سا هەركەسێك بە سەنگایی مێرولەی هەرە وردیلە چاكەی هەبووبێت دەیبینێت. هەركەسیش بە قورسایی مێرولەی هەرە وردیلە خراپەی بووبێت دەیبینێت. وە لە هەردوو سەحیحەكەدا هاتووە لە ئەبوسەعیدی كوڕی خودەریەوە لە پێغەمبەری خوداوە(ﷺ) لە فەرموودە درێژەكەی شەفاعەتدا كە ئەمەشی تێدایە فەرموویەتی:(خودای گەورە دەفەرموویێت: بگەڕێنەوە، هەر

---

[1] الانبیاء(٤٧).

[2] لوقمان(١٦).

[3] الزلزلة(٧– ٨).

کەستان دیت بە قورسایی دەنکە خەردەلێك باوەڕ لە دڵیدایە لە ناو ئاگر دەر بێنن) وە لە وتەیەکی تردا هاتووە:(کەمتر لەویش کەمتر لەویش کەمتر لەویش لە دەنکە خەردەلێك باوەڕ لە دڵیدایە دەری بێنن) پاشان ئەبو سەعید دەڵێت: ئەگەر حەز دەکەن ئەم ئایەتە بخوێنن کە خودای گەورە دەفەرموێت: ﴿إِنَّ ٱللَّهَ لَا يَظۡلِمُ مِثۡقَالَ ذَرَّةٖ﴾ خودا بە قورسی مێرولەی هەرە وردیلە ناهەقی ناکات[1].

### ئایا سزا لەسەر بت پەرستان سووك دەكرێت؟

سەعیدی کوڕی جوبەیر لەم ئایەتەدا کە خودای مەزن دەفەرموێت: ﴿وَإِن تَكُ حَسَنَةٗ يُضَٰعِفۡهَا﴾ بەرامبەر هەر چاکەیەك بیکەن، دوو ئەوەندە پاداشت دەداتەوە. وتی: بت پەرست سزای بۆ سووك دەکرێت بەڵام هەرگیز لەناو ئاگر نایەتە دەرەوە لە ڕۆژی قیامەتدا. بەڵگەش بەم فەرموودە سەحیحە دێنێتەوە کە ئیبنو عەبباس وتی: ئەی پێغەمبەری خودا(ﷺ) مامەکەت ئەبوتالب پارێزگاری لێ دەکردی‌و یارمەتی دەدایت، ئایا هیچ سودێکی پێ دەگەیەنیت؟ فەرمووی:(بەڵێ، ئەو لەناو ئاگرێکی ڕوندایە(بێ دوکەڵ)، ئەگەر من نەبوومایە لە نزمترین پلەی ناو ئاگر دەبوو) لەوانەیە ئەمە تایبەت بێت بە ئەبوتالیبەوە‌ە خودانەناسانی تر نەگرێتەوە. بەڵگەش ئەو فەرموودەیە کە ئەبوداودی تیالیسی ڕیوایەتی کردووە لە موسنەدەکەیدا لە ئەنەسەوە کە پێغەمبەری خوداوە(ﷺ) فەرموویەتی:(بێگومان خودا ناهەقی لە بڕواردار ناکات لە هەر چاکەیەك دەیکاتن هەر لە دونیادا بە بژێوی پاداشتی دەداتەوەو لە ڕۆژی قیامەتیشدا لەسەری پاداشتی دەداتەوە. بەڵام خودانەناس بەهۆی ئەو چاکەوە کردوویەتی لە دونیادا خۆراکی لەسەری پێدەدرێت، کاتێك کە ڕۆژی قیامەت هات هیچ چاکەیەکی بۆنیە) واتە: سود لە هیچ چاکەیەکی لە ڕۆژی قیامەتدا وەرناگرێت.

### مانای پاداشتی گەورە

ئەبوهورەیرەو عیکرەمەو سەعیدی کوڕی جوبەیرو حەسەن‌و قەتادەو زەحاك لەم ئایەتەدا:﴿وَيُؤۡتِ مِن لَّدُنۡهُ أَجۡرًا عَظِيمٗا﴾ واتە: سەرەڕای ئەو پاداشدانەوەیەش خەڵاتی گەورەیان هەیە. وتیان: واتە بەهەشتیان پێ دەدرێت، دەخوزین لە خودای مەزن لێمان ڕازی بێت‌و بەهەشتمان بداتێت. ئیبنو ئەبی حاتەم ڕیوایەتی کردووە لە ئەبو عوسمانی نەهدیەوە(النهدی) وتی: هیچ کەسێك زۆرتر لە من لەگەڵ ئەبوهورەیرەدا هەڵسوکەوتی نەکردووە، ئەو لە پێش من چوو بۆ حەج، منیش دوای ئەو چووم، کاتێك خەڵکی بەسرە لێی دەگێڕنەوە وتی: بیستم لە پێغەمبەری خوداوە(ﷺ) دەیفەرموو:(خودا چاکەیەك بە هەزار هەزار چاکە پاداشت دەداتەوە) وتم: هاوار بۆ ئێوە. هیچ کەسێك لە من زۆرتر لەگەڵ ئەبوهورەیرە هەڵسوکەوتی نەکردووە، من ئەم فەرموودەیەم لێ نەبیستووە، هەوڵمدا پێی بگەم، لە

[1] فتح الباري(٤١٣/١٣)، مسلم(١٦٧/١).

هەواڵم زانی چوو بۆ حەج، منیش چووم بۆ حەج تا پێی بگەم لەبارەی ئەم فەرموودەوە(تا قسەی لەگەڵدا بکەم). دیسان ئیبنو ئەبی حاتەم ڕیوایەتی کردووە لە ڕێگەیەکی ترەوە لە ئەبو عوسمانەوە وتی: وتم ئەی ئەبوهورەیرە، بیستم لەو برایانەم لە بەسرە دەڵێن کە تۆ دەڵێیت: بیستومە لە پێغەمبەری خوداوە(ﷺ) کە فەرموویەتی:(بێگومان خودا پاداشتی چاکەیەك بە هەزار چاکە دەداتەوە) پاشان ئەم ئایەتەی خوێندەوە:[1] ﴿فَمَا مَتَـٰعُ ٱلْحَيَوٰةِ ٱلدُّنْيَا فِى ٱلْـَٔاخِرَةِ إِلَّا قَلِيلٌ﴾[2] گوزەرانی سەر دونیا بەرامبەر گوزەرانی ئەو دونیاتان زۆر شتێکی کەم بایەخە.

**شایەتی دانی پێغەمبەر(ﷺ) لەسەر ئوممەتەکەی لە ڕۆژی قیامەتداو خۆزگەی خودا نەناسانیش بە مردن**

خـــودای مـــەزن دەفـــەرموێت: ﴿ فَكَيْفَ إِذَا جِئْنَا مِن كُلِّ أُمَّةٍۭ بِشَهِيدٍ وَجِئْنَا بِكَ عَلَىٰ هَـٰٓؤُلَآءِ شَهِيدًا﴾ دەبێت چۆن بێت ئەگەر ئێمە لە هەموو ئوممەتێکدا یەکێکمان لێ هەڵبژاردن کە ببنە شایەت لەسەریان، تۆشمـان ئـەی موحەممـەد(ﷺ) کـردە شـایەتێك لەسـەر ئەمانـە. خـودای گـەورە باسـی نارەحەتیو ترسناکی ڕۆژی قیامەت دەکات، کە چ ڕۆژێکی تۆقێنەرو داچڵەکێنەرە، دەبێـت حاڵی ئـەو خەڵکـە لـەو ڕۆژەدا چـۆن بێـت کاتێـك لـە هـەموو ئوممەتێکـدا شـایەتێك دەهێنرێـت، واتـە: پێغەمبەرێك(سەلامی خودا لە پێغەمبەران). وەك خودای گەورە دەفەرموێت: ﴿ وَأَشْرَقَتِ ٱلْأَرْضُ بِنُورِ رَبِّهَا وَوُضِعَ ٱلْكِتَـٰبُ وَجِا۟ىٓءَ بِٱلنَّبِيِّـۧنَ وَٱلشُّهَدَآءِ ﴾[3] ئەم زەمینە بە تیشکی پەروەرێنی خۆی ڕوناکی تـێ دەکەوێتە کتێبی خودا دادەنرێت، پێغەمبەرانو شایەتەکان دەهێنـرێن. وە لـە ئایـەتێکی تـردا خـودای گـــەورە دەفـــەرموێت: ﴿ وَيَوْمَ نَبْعَثُ فِى كُلِّ أُمَّةٍ شَهِيدًا عَلَيْهِم مِّنْ أَنفُسِهِمْ ۖ وَجِئْنَا بِكَ شَهِيدًا عَلَىٰ هَـٰٓؤُلَآءِ ﴾[4] ڕۆژێك لە ناو هەموو گەلێکدا یەکێك لە خۆیان دەکەینە شایەت، تـۆ شایەتی ئێمـەی بەسـەر ئەمانەوە. بوخاری ڕیوایەتی کردووە لە عەبدوڵلای کوڕی مەسعودەوە وتی: پێغەمبـەری خـوداوە(ﷺ) پێی فەرمووم:(قورئان بخوێنەوە بۆم) وتم: ئەی پێغەمبەری خوداوە(ﷺ) قورئان بۆ تۆ بخوێنم کە بـۆ تۆ دابەزیوە؟ فەرمووی:(بـەڵێ مـن پـێم خۆشـە لـە غـەیری خۆمـەوە گـوێم لـێ بێـت) دەسـتم کـرد بـە خوێنـدنی سـورەتی(النـساء) هـەتا گیـشتمە ﴿ فَكَيْفَ إِذَا جِئْنَا مِن كُلِّ أُمَّةٍۭ بِشَهِيدٍ وَجِئْنَا بِكَ عَلَىٰ

---

[1] زەهەبی وتی: زانایان کۆدەنگن لەسەر لاوازی ئەم فەرموودەیە.

[2] التوبة(٣٨).

[3] الزمر(٦٩).

[4] النحل(٨٩).

﴿هَٰؤُلَاءِ شَهِيدًا﴾ فەرمووی: (بەسە ئێستا)، لەوکاتەدا چاوەکانی فرمێسکی لێ دەهاتەخوارەوە.[1]

پاشان خودای گەورە دەفەرموێت: ﴿يَوْمَئِذٍ يَوَدُّ ٱلَّذِينَ كَفَرُوا۟ وَعَصَوُا۟ ٱلرَّسُولَ لَوْ تُسَوَّىٰ بِهِمُ ٱلْأَرْضُ وَلَا يَكْتُمُونَ ٱللَّهَ حَدِيثًا﴾ لەو ڕۆژەدا ئەوکەسانەی لە ڕێی خودا لایانداوە بە قسەی پێغەمبەریان نەکرد، حەز دەکەن زەوی بەسەریاندا تەخت بکرێت، ناشتوانن هیچ قسەیەك لە خودا بشارنەوە. واتە: حەزدەکەن کە زەوی شەق ببات و قوتیان بدات کاتێك کە ئەو ترس و ناڕەحەتیەی ئەو ڕۆژە دەبینن و توشی ئەو هەڕەشەو سوك و ڕیسوایی و ئابڕوچوونە دەبن. وەك خودای گەورە دەفەرموێت: ﴿يَوْمَ يَنظُرُ ٱلْمَرْءُ مَا قَدَّمَتْ يَدَاهُ وَيَقُولُ ٱلْكَافِرُ يَٰلَيْتَنِى كُنتُ تُرَٰبًۢا﴾[2] لەو ڕۆژەدا مرۆڤ چاو بۆ ئەو شتە دەگێڕێت لە پێش خۆی ناردوویەتی خودانەناس دەڵێت: ئای خۆزگە خاك و خۆڵ بوومایە! خودای گەورە لێرەدا دەفەرموێت: ﴿وَلَا يَكْتُمُونَ ٱللَّهَ حَدِيثًا﴾ ناتوانن هیچ قسەیەك لە خودا بشارنەوە. ئەمە ئەوە دەگەیەنێت کە دان دەنێن بە هەموو ئەو شتانەی کە کردوویانەو هیچی لێ ناشارنەوە. عەبدوڕەزاق ڕیوایەتی کردووە لە سەعیدی کوڕی جوبەیرەوە وتی: پیاوێك هات بۆلای ئیبنو عەباس و وتی: هەندێك شت هەیە لە قورئاندا لەلام ڕوون نیە(لێی تێناگەم)، وتی: ئەوە کامەیە؟ ئایا گومانە لە قورئاند؟ وتی: ئەوە گومان نیە بەڵکو جیاوازیەکە، وتی: ئەوەی لات ڕوون نیە بە جیاوازی دەزانی بیڵێ، وتی: گوێ بگرە خودای گەورە دەفەرموێت: ﴿ثُمَّ لَمْ تَكُن فِتْنَتُهُمْ إِلَّآ أَن قَالُوا۟ وَٱللَّهِ رَبِّنَا مَا كُنَّا مُشْرِكِينَ﴾[3] پاشان هیچ بەهانەیەکیان نەبوو جگە لەوەی کە وتیان: سوێند بە خودای پەروەردگارمان، ئێمە هیچ شتێکمان نەکردووتە شەریکی ئەو. وە دەفەرموێت: ﴿وَلَا يَكْتُمُونَ ٱللَّهَ حَدِيثًا﴾ ناتوانن هیچ قسەیەك لە خودا بشارنەوە. کەچی شاردبوویانەوە. ئیبنو عەباس وتی: لەبارەی ئەم ئایەتەوە کە خودای گەورە دەفەرموێت: ﴿لَمْ تَكُن فِتْنَتُهُمْ إِلَّآ أَن قَالُوا۟ وَٱللَّهِ رَبِّنَا مَا كُنَّا مُشْرِكِينَ﴾ ئەوانە کاتێك لە ڕۆژی قیامەتدا بینیان خودا تەنیا لە خاوەن باوەڕان خۆش دەبێت، لە گوناهیان دەبورێت و هەرچەندە گوناهەکانیشیان گەورە بێت هەر لێیان خۆش دەبێت، بەڵام لەو شەریك دانەرانە خۆش نابێت کە موشریکەکان بۆیان دانابوو، دەڵێن: ﴿وَٱللَّهِ رَبِّنَا مَا كُنَّا مُشْرِكِينَ﴾ سوێند بە خودای پەروەردگارمان ئێمە هیچ شتێکمان نەکردووەتە شەریکی ئەو. بە هیوای ئەوەی لێیان خۆش ببێت. خودای گەورەش مۆری ناوە بەسەر دەمیانداو دەست و

---

[1] فتح الباری(٧١٢/٨).

[2] نبأ(٤٠).

[3] الانعام(٢٣).

قاچەکانیان قسە دەکەن لەبارەی ئەو شتانەوە کە کردوویانە. ئا لەوکاتەدا ﴿يَوَدُّ ٱلَّذِينَ كَفَرُوا۟ وَعَصَوُا۟ ٱلرَّسُولَ لَوْ تُسَوَّىٰ بِهِمُ ٱلْأَرْضُ وَلَا يَكْتُمُونَ ٱللَّهَ حَدِيثًا ﴾[1].

﴿ يَـٰٓأَيُّهَا ٱلَّذِينَ ءَامَنُوا۟ لَا تَقْرَبُوا۟ ٱلصَّلَوٰةَ وَأَنتُمْ سُكَـٰرَىٰ حَتَّىٰ تَعْلَمُوا۟ مَا تَقُولُونَ وَلَا جُنُبًا إِلَّا عَابِرِى سَبِيلٍ حَتَّىٰ تَغْتَسِلُوا۟ ۚ وَإِن كُنتُم مَّرْضَىٰٓ أَوْ عَلَىٰ سَفَرٍ أَوْ جَآءَ أَحَدٌ مِّنكُم مِّنَ ٱلْغَآئِطِ أَوْ لَـٰمَسْتُمُ ٱلنِّسَآءَ فَلَمْ تَجِدُوا۟ مَآءً فَتَيَمَّمُوا۟ صَعِيدًا طَيِّبًا (٤٣) ﴾

**قەدەغەکردنی نوێژکردن لەکاتی سەرخۆشی و لەش پیسیدا**

خودای مەزن نوێـژکردنی بەسەرخۆشی لـە عەبدە خـاوەن باوەڕەکانی قەدەغـە دەکات کە نوێـژ خوێنەکە نازانێت لەکاتی ئەو سەرخۆشیەدا چی دەڵێت، وە قەدەغەشی کردووە لە کەسێك لەشی پیس بێت نزیکی مزگەوت بکەوێتەوە مـەگین کەسـێك لـە دەرگایەکـەوە تێپـەڕێت بـۆ دەرگایـەکی تـرو لـەناو مزگەوتـدا نەمێنێتـەوە. ئـەم قەدەغەکردنـە لـە پـێش حـەرام کردنـی مـەیدا(ئارەقـدا) بـووە، وەك ئـەو فـەرموودەی کـە لـە سـورەتی بەقـەڕەدا باسمـان کـرد گەیانـدی لـەم ئایەتـەدا کـە خـودای گـەورە دەفـەرموێت: ﴿يَسْـَٔلُونَكَ عَنِ ٱلْخَمْرِ﴾[2] لێـت دەپرسـن دەربـارەی مـەی. پێغەمبـەری خـودا(ﷺ) خوێندیـەوە بەسـەر عومـەردا. عومـەر وتـی: ئـەی خودایـە لەبارەی مەیـەوە ڕوونکردنەوەیـەکی تێـرو تەواومان بۆ بکە. کاتێك ئەم ئایەتـە هاتـە خـوارەوە خوێندیـەوە بەسـەر عومـەردا. عومـەر وتـی: ئـەی خودایە لەبارەی مەیەوە ڕوونکردنەوەیەکی تەواومان بۆ بکە، لەو کاتەدا ئەم ئایەتە هاتە خوار لە کاتی نوێژەکاندا مەیان نەدەخواردەوە. کە ئـەم ئایەتـە هاتـە خـوارەوە ﴿يَـٰٓأَيُّهَا ٱلَّذِينَ ءَامَنُوٓا۟ إِنَّمَا ٱلْخَمْرُ وَٱلْمَيْسِرُ وَٱلْأَنصَابُ وَٱلْأَزْلَـٰمُ رِجْسٌ مِّنْ عَمَلِ ٱلشَّيْطَـٰنِ فَٱجْتَنِبُوهُ لَعَلَّكُمْ تُفْلِحُونَ ﴾ هـەتا دەگاتـە ﴿فَهَلْ أَنتُم مُّنتَهُونَ﴾[3] ئـەی گەلی خاوەن بـاوەڕان مـەیی خـۆری و قوماربـازی و کێـل و بـەرد پەرسـتی و گرەو لەسـەر تیرگرتن، لـە کارەکانی شەیتانن، خۆتانی لێ بپارێزن بەڵکو ڕزگار ببن. هەتا دەگاتـە، ئایا ئێـوە دەسـت لـەو کارانـە بەردەدەن؟ عومەر وتی: وازمان هێنا وازمان هێنا.[4] وە لە ڕیوایەتێکی تردا هاتووە: ئەم ئایەتەی کە لـە سورەتی نیسائدایە کـە خـودای گـەورە دەفـەرموێت: ﴿ يَـٰٓأَيُّهَا ٱلَّذِينَ ءَامَنُوا۟ لَا تَقْرَبُوا۟ ٱلصَّلَوٰةَ وَأَنتُمْ

---

[1] عبدالرزاق(١/١٦٠).

[2] البقرة(٢١٩).

[3] المائدة(٩٠– ٩١).

[4] أحمد(١/٥٣) فەرموودەیەکی مورسەلە لە ئیسرائیلەوە.

سُكَٰرَىٰ حَتَّىٰ تَعۡلَمُواْ مَا تَقُولُونَ ﴾ ئەی گەلی خاوەن باوەڕان بەسەرخۆشی نزیکی نوێژ مەبنەوە هەتا تێبگەن دەڵێن چی. بانگ بێژەکەی پێغەمبەر(ﷺ) کە کاتی نوێژ هات بانگەوازی کرد: ئەوسا سەرخۆش نزیکی نوێژ نەبێتەوە[1] وتەکە هی ئەبو داودەو زانایان لە هۆی هاتنە خوارەوەی ئەم ئایەتەدا ئەم فەرموودەیان هێناوە کە ئیبنو ئەبی حاتەم ڕیوایەتی کردووە لە سەعدەوە وتی: لەسەر من چوار ئایەت هاتوتە خوارەوە. پیاوێکی ئەنساری خواردنێکی دروستکرد هەندێك کەس لە کۆچەریەکان و هەندێك کەسیشی لە ئەنساریەکان بانگ کرد. خواردمان و خواردمانەوە هەتا سەرخۆش بووین. پاشان دەستمان دایە شانازی کردن. پیاوێك شەویلگەی وشترێکی بەرزکردەوە لوتی سەعدی پێ لەت(شەق) کرد. سەعد لوتی شەق بوو، ئەم ڕوداوە لەپێش حەرام کردنی مەیدابوو. ئەم ئایەتە هاتە خوارەوە کە خودای گەورە دەفەرمووێت: ﴿ يَٰٓأَيُّهَا ٱلَّذِينَ ءَامَنُواْ لَا تَقۡرَبُواْ ٱلصَّلَوٰةَ وَأَنتُمۡ سُكَٰرَىٰ ﴾ [2] ئەم فەرموودەیە لە سەحیحی موسلیمدا بەدرێژی هاتووە.[3] زانایانی فەرموودە ڕیوایەتیان کردووە جگە لە ئیبنوماجە[4].

### هۆیەکی تر

ئیبنو ئەبی حاتەم ڕیوایەتی کردوە لە عەلی کوڕی ئەبو تالیبەوە(ڕەزای خودای لێ بێت) وتی: عەبدوڕەحمانی کوڕی عەوف خواردنێکی بۆ دروست کردین بانگی کردین، مەی(ئارەقی) داینێ، مەیەکە هەندێکمانی گرت(سەرخۆش کرد) کاتی نوێژ هات فلانەکەسیان پێشخست بۆ نوێژکردن وتی: ئەمەی خوێند:(قل يأيها الكافرون، ما أعبد ما تعبدون، ونحن نعبد ما تعبدون) بەڵێ ئەی خودانەناسان، ئەوەی ئێوە دەیپەرستن نایپەرستم، ئەوەی ئێوەش دەیپەرستن ئێمەش دەیپەرستن. خودای گەورە ئەم ئایەتەی ناردەخوارەوە: ﴿ يَٰٓأَيُّهَا ٱلَّذِينَ ءَامَنُواْ لَا تَقۡرَبُواْ ٱلصَّلَوٰةَ وَأَنتُمۡ سُكَٰرَىٰ حَتَّىٰ تَعۡلَمُواْ مَا تَقُولُونَ ﴾[5] ترمیزیش هەر بەم شێوە ڕیوایەتی کردووە[6] وتی: ئەم فەرموودەیە حەسەن و سەحیحە. خودای گەورە دەفەرمووێت: ﴿حَتَّىٰ تَعۡلَمُواْ مَا تَقُولُونَ ﴾ ئەمە چاکترین شتە کە لەبارەی سەرخۆشەوە وتراوە، چونکە سەرخۆش نازانێت چی لە دەمی دەردەچێت. خوێندنەوەکەی لێ تێکدەچێت و هۆشی لەلای خۆی نامێنێت و خوشوع و گەردنکەچی بۆناکرێت. ئیمامی ئەحمەد ڕیوایەتی کردووە لە ئەنەسەوە وتی:

---

[1] أبوداود(٤/٨٠) فەرموودەیەکی مورسەلە لە ئیسرائیلەوە.

[2] مسند الطيالى(٢٨) فەرموودەیەکی سەحیحە.

[3] مسلم(٤/١٨٧٨).

[4] أبو داود(١٧٧٣)، تحفة الاحوذى(٨/٤٦٦)، النسائى فى الكبرى(٦/٣٤٨) سەحیحە.

[5] الطبري(٨/٣٧٨).

[6] تحفة الاحوذي(٨/٣٨٠) فەرموودەیەکی حەسەن و سەحیحە.

پێغەمبەری خودا(ﷺ) فەرموویەتی:(ئەگەر یەکێك لەئێوە وەنەوزی دەدا لە کاتێکدا کە نوێژی دەکرد با سەلام بداتەوەو لێی بخەوێت هەتا بزانێت چی دەڵێت)[1] واتە: کە خەوەکەی نەما ئەوکاتە هەڵسێت نوێژ بکات، بوخاری خۆی ئەم فەرموودەی هێناوە موسلیمی لەگەڵدا نیە.[2] نەسائیش ڕیوایەتی کردووە[3] وە لە هەندێ وتەی ئەم فەرموودەدا هاتووە:(لەوانەیە بڕوات داوای لێبوردن بکات لەباتی ئەوەدا قسە بە خۆی بڵێت)[4] پاشان خودای گەورە دەفەرموێت: ﴿وَلَا جُنُبًا إِلَّا عَابِرِي سَبِيلٍ حَتَّىٰ تَغْتَسِلُوا﴾ بە لەش پیسیش نوێژ مەکەن(مەگین کاتێك تێپەڕن) بە مزگەتدا هەتا کاتێك کە خۆ دەشۆرن. ئیبنو ئەبی حاتەم ڕیوایەتی کردووە لە ئیبنو عەباسەوە لەم ئایەتەدا ﴿وَلَا جُنُبًا إِلَّا عَابِرِي سَبِيلٍ حَتَّىٰ تَغْتَسِلُوا﴾ وتی: مەچنە مزگەوت کاتێك کە لەشتان پیس بوو. تەنیا بە تێپەڕین بە ناویدا بڕۆنو تێیدا دامەنیشن.[5] پاشان وتی: ڕیوایەت کراوە لە عەبدوڵڵای کوڕی مەسعودو ئەنەس‌و ئەبو عوبەیدەو سەعیدی کوڕی موسیبو ئەبو زوماو عەتاو موجاهدو مەسروق‌و ئیبراهیمی نەفەعی‌و زەیدی کوڕی ئەسلەم ئەبو مالیك‌و عەمری کوڕی دینارو حەکەمی کوڕی عوتەیبەو عیکرەمەو حەسەنی بەسری‌و یەحیای کوڕی سەعیدی ئەنساری‌و ئیبنو شەهاب و قەتادەوە هەر بەوشێوەیە[6]. ئیبنو جەریر ڕیوایەتی کردووە لە یەزی کوڕی ئەبو حەبیبەوە لەم ئایەتەدا کە خودای گەورە دەفەرموێت: ﴿وَلَا جُنُبًا إِلَّا عَابِرِي سَبِيلٍ﴾ چەن پیاوێك لە ئەنساریەکان دەرگاکانیان لەسەر مزگەوت بوو، توشی لەش پیسی دەهاتن ئاویان لەلانەبوو، ئاویشیان دەویست، هیچ ڕگەیکیان نەبوو تەنیا لەناو مزگەوتەوەو نەبێتن خودای گەورە ئەم ئایەتەی ناردەخوارەوە: ﴿وَلَا جُنُبًا إِلَّا عَابِرِي سَبِيلٍ﴾[7] بەڵگەش لەسەر ڕاستی ئەم قسەیەی یزیدی کوڕی حەبیبە(ڕەحمەتی خودای لێ بێت) ئەمە فەرموودەیەکە کە لە سەحیحی بوخاریدا هاتووە کە پێغەمبەری خودا(ﷺ) فەرموویەتی:(هەموو دەرگاکان بگرن جگە لەدەرگاکەی ئەبوبەکر)[8] پێغەمبەر(ﷺ) لە کۆتایی ژیانیدا ئەمەی فەرموو، چونکە دەیزانی ئەبوبەکر دوای خۆی ئەو فەرمانە

---

[1] أحمد(١٤٢/٣) فەرموودەیەکی سەحیحە.

[2] فتح الباری(٣٧٧).

[3] النسائي(٢١٥/١) فەرموودەیەکی سەحیحە.

[4] فتح الباری(٣٧٥/١)

[5] الطبري(٣٨٢/٨).

[6] الطبري(٣٨١/٨/٣٨٤).

[7] الطبری(٣٨٢/٨).

[8] فتح الباری(٦٦٥/١).

دەكرێتەئەستۆ، پێویستی زۆری بە چوونە ناو مزگەوت دەبێت بۆ ئەو كارە گرنگانەی ناو موسڵمانان پێویستیان پێیەتی. هەر بۆیە فەرمانی دا بە گرتنی ئەو دەرگایانەی بەناو مزگەوتدا تێدپەڕێت جگە لە دەرگاكەی ئەبوبەكر. وە ڕیوایەت كراوە(جگە لە دەرگاكەی عەلی) وەك لە هەندێك كتێبی زانایانی فەرموودەدا هاتووە ئەوە هەڵەیە، ڕاستیەكەی ئەوەیە كە لە كتێبە سەحیحەكاندا هاتووە. لە سەحیحی موسلیمدا هاتووە لە عائیشەوە(ڕەزای خودای لێ بێت) وتی: پێغەمبەری خودا(ﷺ) پێی وتم:( پێغەمبەری خودا(ﷺ) لە مزگەوتدا مابوو، فەرمووی: ئەو پۆشاكانەم بدەری) وتم: من لە حەیزدام، فەرمووی:(خۆ حەیزكەت لە دەستتدانیە)[1] هەر بەم شێوە لە ئەبوهورەیرەشەوە ڕیوایەت كراوە[2] ئەم فرموودەیە بەڵگەیە لەسەر ئەوەی كە دروستە ئافرەت لە حەیزدابێت بەناو مزگەوتدا تێپەڕێت. ئەوەش خوێنی پاش منداڵ بوونیشی ببێت، هەر دروستە بەناو مزگەوتدا تێپەڕێت والله أعلم.

**باسی تەیەموم**

خودای مەزن دەفەرموێت: ﴿وَإِن كُنتُم مَّرْضَىٰٓ أَوْ عَلَىٰ سَفَرٍ أَوْ جَآءَ أَحَدٌ مِّنكُم مِّنَ ٱلْغَآئِطِ أَوْ لَـٰمَسْتُمُ ٱلنِّسَآءَ فَلَمْ تَجِدُوا۟ مَآءً فَتَيَمَّمُوا۟ صَعِيدًا طَيِّبًا﴾ وە ئەگەر ئێوە نەخۆش بوون یان لە سەفەردا بوون، یان یەكێكتان لە شوێنی دەست بەئاو هاتەوە یان توخنی ژنان كەوتن‌و ئاوتان دەست نەكەوت، بە خۆڵێكی پاك تەیەموم بكەن‌و دەم‌وچاوو دەستەكانتانی پێ بەهسوون. واتە: نەخۆشی هۆكارێكە بۆ ڕەوادانی تەیەموم، ئەو نەخۆشیەی بەكارهێنانی ئاو ترس هەیە بۆی یان ببێتە هۆی لەناوچوونی ئەندامێكی لاشەو خراپ بوونی یان بەكارهێنانی ئاو ببێت هۆی درێژەكێشانی نەخۆشیەكە. هەندێك لە زانایان ڕێگەیانداوە بە تەیەموم كردن هەر بەبوونی نەخۆشی، گشتگیری ئایەتەكەیان كردووەتە بەڵگە. سەفەریش دیارە، جیاوازیش نیە لە نێوان سەفەری كورت‌و درێژدا. ﴿أَوْ جَآءَ أَحَدٌ مِّنكُم مِّنَ ٱلْغَآئِطِ﴾ یان یەكێكان لەسەر پێش ئاو هاتەوە، ﴿ٱلْغَآئِطِ﴾ شوێنی چاڵ‌و چۆڵی، لەباتی دەست بەئاو گەیاندن بەكارهێنراوە. لە بێ دەست نوێژی بچوك. ﴿أَوْ لَـٰمَسْتُمُ ٱلنِّسَآءَ﴾ بە(لَمستم) یش خوێندراوەتەوە، واتە: دەستدان لە ئافرەت. بەلام ﴿لَـٰمَسْتُمُ﴾ مەبەست پێی سەرجێ كردنە لەگەڵی(الجماع) وەك خودای گەورە دەفەرموێت: ﴿وَإِن طَلَّقْتُمُوهُنَّ مِن قَبْلِ أَن تَمَسُّوهُنَّ وَقَدْ فَرَضْتُمْ لَهُنَّ فَرِيضَةً فَنِصْفُ مَا فَرَضْتُمْ﴾[3] خۆ ئەگەر مارەییەكەتان بڕیبۆوەو هێشتان سەرجێتان لەگەڵ نەكردبوو، تەلاقتاندان نیوەی مارەییان

[1] مسلم(١/٢٤٥).

[2] مسلم(٢٤٥).

[3] البقرة(٢٣٧).

دەکــــەوێت. وە دەفـــــەرموێت: ﴿يَٰٓأَيُّهَا ٱلَّذِينَ ءَامَنُوٓاْ إِذَا نَكَحۡتُمُ ٱلۡمُؤۡمِنَٰتِ ثُمَّ طَلَّقۡتُمُوهُنَّ مِن قَبۡلِ أَن تَمَسُّوهُنَّ فَمَا لَكُمۡ عَلَيۡهِنَّ مِنۡ عِدَّةٖ تَعۡتَدُّونَهَا﴾[1] ئـەی گـەلی خـاوەن بـاوەڕان، ئەگـەر ژنـی باوەڕدارتـان مارەکردو بەرلەوەی سەرجێیات لەگەڵدا بکەن تەلاقتاندان، بۆتـان نیـە تـا ماوەیـەکی دیاریکراو ڕایـان بگرن. ئیبنـو ئـەبی حاتـەم ڕیوایـەتی کردووە لـە ئیبنـو عەباسـەوە لـەم دەقـەدا کـە خـودای گـەورە دەفەرموێت: ﴿أَوۡ لَٰمَسۡتُمُ ٱلنِّسَآءَ﴾ وتی: مەبەست پێی سـەرجێی کردنـە(الجماع)[2] هـەر بـەم شێوەیە ڕیوایـەتکراوە عـەلی‌و ئوبـەیی کـوڕی کـەعبو موجاهـدو تـاووس‌و حەسـەن‌و عوبەیـدی کـوڕی عومـەیرو سـەعیدی کـوڕی جوبـەیرو شـەعبی‌و موقـاتیلی کـوڕی حـەیان‌و قـەتادەوە[3] پاشـان خـودای گـەورە دەفەرموێت: ﴿فَلَمۡ تَجِدُواْ مَآءٗ فَتَيَمَّمُواْ صَعِيدٗا طَيِّبٗا﴾ ئەگەر ئاوتان دەست نەکەوت بە خۆڵێکی پـاك تەیـەموم بکـەن. لـە هـەردوو سـەحیحەکەدا هـاتووە لـە عیمرانـی کـوڕی حوسـەینیەوە(حـصین) کـە پێغەمبەری خودا(ﷺ) پیـاوێکی دیت خـۆی جیـا کردبـووەوە لـەو خەڵکـەو نوێـژی لەگەڵدا نـەدکردن فەرمووی:(ئەی فلان چی ڕێگری لێکردی لەگەڵ نوێژدا نەکرد بۆ پیاوێکی موسڵمان نیت؟ ) وتی: بەڵێ، ئەی پێغەمبەری خودا(ﷺ) من تووشی لەش پیسی بووم‌و ئاویش نیە، فـەرمووی:(پێویسته لەسـەرت بە خۆڵ تەیەموم بکەیت، ئەوە بۆ تـۆ بەسـە)[4] تەیـەموم لـە زمانـدا واتـە:ویستن(القـصد) وەك عـەرەب وتویانە:(يتمسك الله بحفظة) واته: (قصدك)، (الـصعيد) واتـە:خـۆڵ، وەك خـودای گـەورە دفـەرموێت: ﴿فَتُصۡبِحَ صَعِيدٗا زَلَقًا﴾[5] ببێتـە زەویـەکی(خـۆڵی) بێرونـی قـاڕ. واتـە: خـۆڵێکی پـاك‌و سـاف. وە لـە سەحیحی موسلیمدا هاتووە لە حوزەیفەی کوڕی یەمانەوە وتی: پێغەمبەری خودا(ﷺ) فـەرمووی:(بـە سێ شت ڕێزمان دراوە بەسەر خەڵکدا: خۆڵی زەویمـان بـۆ کـراوە بـە پـاك‌و پاکـەرەوە ئەگـەر ئاومـان دەسـت نەکـەوت)[6] پاکیەتیەکـەی تایبـەت کـردووە بـە خۆڵەوە،بـە شـێوەی منـەت بەسـەر خـاوەن باوەڕانەوە، خۆ ئەگەر هەر شتێکی تر جێگەی خۆڵی بگرتایەتەوە لەگەڵی باسی دەکرد. مەبەست بـە پاك لێرەدا وتراوە واتە: حەڵاڵ. وتراویشە مەبەست پێی خۆڵێـك پـیس نـەبێت. وەك ئیمامی ئەحمـەدو زاناکانی تری فـەرموده ڕیوایـەتیانکردووە جگـە لـە ئیبنـو ماجـە لـە ئـەبوزەڕەوە وتـی: پێغەمبـەری

---

[1] الاحزاب(٤٩).

[2] الطبری(٣٩٢/٨).

[3] الطبری(٣٩٣/٣٩٢/٨).

[4] فتح الباری(٥٤٥/١)، مسلم(٤٧٤/١).

[5] کهف(٤٠).

[6] مسلم(٣٧١/١).

خودا(ﷺ) فەرموویەتی:(خۆڵی پاك پاكو پاكەرەوەی موسڵمانانە، ئەگەر ئاوی دەست نەكەوت دەساڵ، ئەگەر دەستی كەوت با بیهەموێت(بیدات) لە پێستی بێگومان ئەوە چاكە)[1] ترمیزی وتی: فەرموودەیەكی حەسەنو سەحیە. خودای مەزن دەفەرمووێت: ﴿فَامْسَحُوا بِوُجُوهِكُمْ وَأَيْدِيكُمْ﴾ ڕوخسارو دەستەكانتان پێ بهەنوون(پێ تۆزاوی بكەن)ز تەیەمووم لەجێی دەست نوێژە. بۆ خاوێن كردنەوە پێی، نەك لە جێی هەموو ئەندامەكانیەتی، بەڵكو تەنیا هەنووینی ڕوخسارو هەردوو دەست بەسە بە كۆدەنگی زانایان. ڕاستیش ئەوەیە كە هەنووینی ڕوخسارو هەردوو ناولەپ بەیەك دەست كێشان بە خۆڵدا بەسە. ئیمامی ئەحمەد ڕیوایەتی كردووە لە عەبدوڕەحمانی كوڕی ئەبزەیەوە(ابزى) لە باوكیەوە وتی: پیاوێك هاتە لای عومەر وتی: من لەشم پیس بووەو ئاوم دەست نەكەوتووە، عومەر وتی: نوێژ مەكە، عەمار وتی: ئەی گەورەی موسڵمانان ئایا لە بیرت دێت كاتێك منو تۆ لە سوپایەكدا(سرية) بووین لەشمان پیس بوو ئاومان دەست نەكەوت، تۆ نوێژت نەكرد. بەڵام من خۆم بە خۆڵ هەنووی، كاتێك كە هاتینە لای پێغەمبەر(ﷺ) ئەوەم بۆ باسكرد، فەرمووی:(بێگومان ئەوەت بەس بووە)[2] پێغەمبەر(ﷺ) بە دەستی كێشای بە زەویدا، پاشان فووی پێدا كردو ڕوخسارو هەردوو لەپی پێ هەنووی.[3] ئەم ئوممەتە بە تایبەتی تەیەمومیان بۆ ڕەوایە. بۆ ئوممەتەكانی تر ڕەوا نەبووە. وەك لە هەردوو سەحیحەكەدا هاتووە لە جابری كوڕی عەبدوڵڵاوە(ڕەزای خودایان لێ بێت) وتی: پێغەمبەر(ﷺ) فەرموویەتی:(پێنج شتم پێدراوە، لە پێش مندا بە هیچ كەس نەدراوە: بە مانگەڕێیەك(بەوەی كە خەڵك لێم بتسێت) یارمەتی دراوم. هەموو زەویم بۆ كراوە بە مزگەوتو بە پاكو پكەرەوە. لە هەر جێگەیەكدا كەسێك كاتێك نوێژی بەسەردا هات لەوێ نوێژ بكات) وە لە وتەیەكی تر هاتووە:(پاكو پاكەرەوەو مزگەوتی خۆی لەلایە، تالانیم بۆ حەڵاڵ كراوە، لەپێش مندا بۆ كەس حەڵاڵ نەبووە، شەفاعەتم پێدراوە. پێغەمبەرانی پێش من بۆ هۆزی خۆی نێردراوە من بۆ هەموو خەڵكی ڕەوانە كراوم)[4] وە لە پێشەوە لە فەرموودەكەی حوزەیفەدا كە موسلیم ڕیوایەتی كردبوو باسمان كرد كە پێغەمبەر(ﷺ) فەرموویەتی:(بە سێ شت ڕێزمان دراوە بەسەر خەڵكدا: سەفەكانمان وەك سەفی فریشتەكان لێكراوە. هەموو زەمینمان بۆ كراوە بە مزگەوت. خۆڵی زەمینمان بۆ كراوە بە پاكو پاكەرەوە ئەگەر ئاومان دەست نەكەوت) خودای گەورە لەم ئایەتە پیرۆزەدا دەفەرمووێت: ﴿فَامْسَحُوا

[1] أحمد(٥/١٨٠)، أبوداود(١/٢٣٥)، تحفة الاحوذي(١/٣٨٨)، النسائي(١/١٧١) فەرموودەیەكی حەسەنی سەحیحە.

[2] أحمد(٤/ ٢٦٥) فەرموودەیەكی سەحیحە.

[3] فتح الباري(١/٥١٩)، مسلم(١/٣٧٠).

[4] مسلم(١/٣٧١).

﴿ بِوُجُوهِكُمْ وَأَيْدِيكُمْ إِنَّ ٱللَّهَ كَانَ عَفُوًّا غَفُورًا ﴾ خودا چاوپۆشیتان لێ دەکات‌و لێتان دەبورێت. واتـە: لـە لێبوردەیی‌و بەخشندەیی ئەوەیە کە تەیەمومی بۆ ڕەواداون‌و نوێـژی پـێ حەڵاڵ کـردووە بۆتـان کـە ئاوتان دەست نەکەوت. بۆ ئاسانکاری‌و سوك کردنی ئەرکەکانە لەسەرتان. چونکە ئـەم ئایەتـە باسـی ئەوە دەکات کە دەبێت بڕوادار بە پاك‌و خاوێنی‌و بیرو هۆشەوە نوێژ بکات‌و بە شێوەیەکی ناتەواو نەیکات لە کاتی سەرخۆشیدا نەیکات هەتا دێتەوە سەرخۆی بۆئەوەی بزانێت چی دەڵێت، یـان لەشـی پیس بوو هەتا خۆی نەشۆرێت یان دەست نوێژی نەبوو هەتا دەست نوێـژ نـەگرێت نابێت نوێـژ بکـات، مەگین کاتێك کە نەخۆش بێـت یـان ئـاوی دەسـت نەکـەوێت، ئـا لەوێدا خـودای مـەزن ڕێگـەی پێداوە تەیەموم بکات. ئەمەش لە سۆزو بـەزەیی خوداوەیـە بەرامبـەر عەبدەکانی ئاسانکاری دەکـات بۆیـان. سوپاس‌و ستایش بۆ خودای گەورە.

### باسی هۆی دابەزینی ڕەوادانی تەیەموم

بوخاری ڕیوایەتی کردووە لـە عائیـشەوە وتـی: لەگـەڵ پێغەمبـەر(ﷺ) دەرچـووین لـە سـەفەرێکدا ڕۆیشتین تا گەیشتینە بەیداء(البیداء) یان(ذات الجیش) ملوانکەکەم پچڕایەوە، پێغەمبـەر(ﷺ) مایـەوە بۆ دۆزینەوەی خـەڵکیش لـە خـزم تیامانـەوە، لەسـەر ئـاو نـەبوون ئاویـشیان پـێ نـەبوو، هـاتن بـۆلای ئەبوبـەکرو پێیـانوت: دەزانـی عائیـشە چـی کـرد؟ پێغەمبـەر(ﷺ) ئـەو خەڵکـەی هێشتووەتەوە(بەندکردووە) نە لەسەر ئاون‌و نە ئاویان پێیە؟ ئەبوبەکر هـات پێغەمبـەر(ﷺ) سـەری لەسەر ڕانم بوو وستبوو وتی: پێغەمبەرت(ﷺ) گیرداوە‌و خەڵکیشت بەند کردووە نە ئاویان پێیەو نـە لەسەر ئاون، دەستی بەسەرزەنشتم کرد، تا خودا حەزبکات سەرزەنشتی کردم سیخورمەی لـێ دەدام، ئەوە نەبوایە کە سەری پێغەمبەر(ﷺ) لەسەر ڕانم بوو نەمدەتوانی ببـزوم نـەکات خەبـەری بێتـەوە. نەبزم‌و وتم: کە ڕۆژ بووەوە پێغەمبەر(ﷺ) لە خەو هەڵسا لەسەر ئاو نەبوون کە دەسـت نوێـژ بـشۆن، خودا ئایەتی تەیەمومی ناردەخوارەوە (تەیەمومیان کرد) ئوسەیدی کـوڕی حـوزیر(حضیر) وتـی: ئـەم بەرەکەتـە کـە خـودا بـۆی ڕەوادایـن بـۆ تەیـەموم، ئەوەنیـە یەکـەم بەرەکـەتی ئێـوە بێـت ئـەی ئـالی ئەبوبەکر. عائیشە وتی: کە وشترەکەیان هەڵساند ملوانکەکەم لە ژێریدا دۆزیـەوە[1]. موسلیم‌و بوخـاری ڕیوایەتیان کردووە[2].

﴿ أَلَمْ تَرَ إِلَى ٱلَّذِينَ أُوتُوا۟ نَصِيبًا مِّنَ ٱلْكِتَـٰبِ يَشْتَرُونَ ٱلضَّلَـٰلَةَ وَيُرِيدُونَ أَن تَضِلُّوا۟ ٱلسَّبِيلَ ﴿٤٤﴾ وَٱللَّهُ أَعْلَمُ بِأَعْدَآئِكُمْ ۚ وَكَفَىٰ بِٱللَّهِ وَلِيًّا وَكَفَىٰ بِٱللَّهِ نَصِيرًا ﴿٤٥﴾ مِّنَ ٱلَّذِينَ هَادُوا۟ يُحَرِّفُونَ ٱلْكَلِمَ عَن مَّوَاضِعِهِۦ وَيَقُولُونَ

---

[1] فتح الباری(١/٥١٤).

[2] فتح الباری(٧/٢٣/١٢/١٨٠)، مسلم(١/٢٧٩).

سَمِعْنَا وَعَصَيْنَا وَاسْمَعْ غَيْرَ مُسْمَعٍ وَرَاعِنَا لَيًّا بِأَلْسِنَتِهِمْ وَطَعْنًا فِي الدِّينِ وَلَوْ أَنَّهُمْ قَالُوا سَمِعْنَا وَأَطَعْنَا وَاسْمَعْ وَانظُرْنَا لَكَانَ خَيْرًا لَّهُمْ وَأَقْوَمَ وَلَٰكِن لَّعَنَهُمُ اللَّهُ بِكُفْرِهِمْ فَلَا يُؤْمِنُونَ إِلَّا قَلِيلًا ﴿٤٦﴾ ﴾

**زەمكردنی جولەكە لەسەرهەڵبژاردنی گومڕایی و گۆڕانی و تاری خوداو سەرپێچی و زمان لە لاڵچ گرتن و تانە لەدین دانیان**

خـــودای مـــەزن دەفـــەرموێت: ﴿ أَلَمْ تَرَ إِلَى الَّذِينَ أُوتُوا نَصِيبًا مِّنَ الْكِتَابِ يَشْتَرُونَ الضَّلَالَةَ ﴾ ئایـا ئەوانەت نەدیوە كە بەشێك لە كتێبی خودایان پێدراوە، كە گۆڕانی هەڵدەبژێرن(دەكرن) خودای گەورە باسی جولەكەكان دەكات(بەر نەفرینی بەردەوامی خودا بكەون تا ڕۆژی قیامەت) كە چۆن ڕێگەی ڕاست دەگۆڕنەوە بە گومڕایی و دژایەتی ئەوە دەكەن كە خودا ناردوویەتەخوارەوە بۆ پێغەمبەرەكەی، وە ئەو زانیاریەی لەلایانە كە لەلایەن پێغەمبەرە پێشینەكانەوە پێیان گەیشتووە وازی لێ دێنن كە دەربارەی سیفەتی پێغەمبەر(ﷺ) بۆیان هاتووە ، بەنرخێكی كەم لە دەستی خۆیان دەدەن و ڕێ لە خۆ هەڵە دەكەن بۆ كەسێك لە دەستهێنانی دونیا. ﴿وَيُرِيدُونَ أَن تَضِلُّوا السَّبِيلَ ﴾ دەشیانەوێت ئێوەش لە ڕێگە لابدەن. واتە: حەزدەكەن ئێوەش وەك ئەوان بڕواتان نەبێت بەوەی كە بۆتان هاتووەتەخوارەوە ئەی خاوەن باوەڕان. وازبێنن لەو ڕێگە ڕاستەو ئەو شارەزاییە بەسودەی دەستان كەوتووە. ﴿وَاللَّهُ أَعْلَمُ بِأَعْدَائِكُمْ ﴾ خودا دوژمنانی ئێوە لە خۆتان باشتر دەناسێت. ئاگادارتان دەكاتەوە لێیان. ﴿وَكَفَىٰ بِاللَّهِ وَلِيًّا وَكَفَىٰ بِاللَّهِ نَصِيرًا ﴾ ئێوە خودا دۆستتان بێت یاریدەرتان بێت بەسە. واتە: هەركەسێك پەنای پێ ببات خودا بەسە دۆستی بێت. وە هەركەسێكیش داوای یارمەتی لێ بكات هەر ئەوەی بەسە. پاشان خودای مەزن دەفەرموێت: ﴿مِّنَ الَّذِينَ هَادُوا ﴾ هەندێ كەس لە جولەكەكان (مِن) لێردا بۆ بەیانی جنسە، وەك خودای گەورە لە ئایەتی تردا دەفەرموێت: ﴿فَاجْتَنِبُوا الرِّجْسَ مِنَ الْأَوْثَانِ ﴾[1] لە چڵكی بتەكان دوورەپەرێز بن. وە دەفەرموێت: ﴿يُحَرِّفُونَ الْكَلِمَ عَن مَّوَاضِعِهِ ﴾ فەرموودەكانی خودا دەگۆڕن و قسەی تر دەخەنە جێی. واتە: وتەكانی خودا بەشێوەیەكی تر مانا دەكەن و بەو شێوەیەی خودا ناردوویەتی تەفسیری ناكەن. هەر بە ئارەزوی خۆیان درۆو بوختان دەكەن. ﴿وَيَقُولُونَ سَمِعْنَا وَعَصَيْنَا ﴾ دەڵێن بیستمان و گوێمان پێ نەدا. واتە: دەڵێن ئەی موحەممەد(ﷺ) ئەوەی وتت بیستمان، بەڵام گوێڕایەڵیت ناكەین دەربارەی ئەوەی كە

---

[1] الحج(٣٠).

تێیدا هاتووە، موجاهدو ئیبنو زەید وا تەفسیریان کردووە[1] مەبەستیش هەر ئەمەیە، ئەمە ئەوپەڕی خودانەناسیو لاسارییە، ئەوانە پشت دەکەنە کتێبی خودا دوای ئەوەی لێی تێنەگەیشتن، خۆیان باش دەزانن لەوکارەیاندا تووشی چ گوناهو تاوانێك دەبن. ﴿وَاسْمَعْ غَيْرَ مُسْمَعٍ﴾ تۆش ببیستە، وەك قەت گوێت لە ئێمە نەبێت. واتە: تۆش گوێ لە ئێمە بگرە، وەك ئەوەی هەرگیز گوێت لە ئێمە نیە. زحاك لە ئیبنو عەباسەوە ڕیوایەتی کردووە.[2] ئەمە گاڵتەپێکردنو بێ ڕێزی بوو بەرامبەر پێغەمبەر(ﷺ) دەیانکرد(بەر نەفرینی خودا بکەون). ﴿وَرَاعِنَا لَيًّا بِأَلْسِنَتِهِمْ وَطَعْنًا فِي الدِّينِ﴾ زمانیان لەلا پێچ دەکرنو بە تەشەرەوە دەڵێن: ﴿وَرَاعِنَا﴾ چاك گوێمان بۆ بگرە.(بەڵام بە زمانی جولەکە واتە تۆ خراپترینمانی) وە تانە لە ئاین دەدەن. واتە: وای دەردەخەن کە دەڵێن: باش گوێمان بۆ بگرە، بەڵام بە زمانی خۆیان مەبەستیان قسە وتنە بە پێغەمبەر(ﷺ) لە پێشەوە لەم ئایەتە باسکرا کە خودای مەزن دەفەرموێت: ﴿يَا أَيُّهَا الَّذِينَ آمَنُوا لَا تَقُولُوا رَاعِنَا وَقُولُوا انْظُرْنَا﴾[3] ئەی کۆمەڵی خاوەن باوەڕان ئێوە مەڵێن ﴿رَاعِنَا﴾ بڵێن: تەماشا بکە. هەر بۆیە خودای گەورە لەبارەی ئەو جولەکانەی کە مەبەستیان بەقسەکانیان پێچەوانەی ئەوەبوو کە دەریاندەخست دەفەرموێت: ﴿لَيًّا بِأَلْسِنَتِهِمْ وَطَعْنًا فِي الدِّينِ﴾ واتە: مەبەستیان گاڵتەو بێ ڕێزی بوو بەرامبەر پێغەمبەر(ﷺ) پاشان خودای گەورە دەفەرموێت: ﴿وَلَوْ أَنَّهُمْ قَالُوا سَمِعْنَا وَأَطَعْنَا وَاسْمَعْ وَانْظُرْنَا لَكَانَ خَيْرًا لَهُمْ وَأَقْوَمَ وَلَكِنْ لَعَنَهُمُ اللَّهُ بِكُفْرِهِمْ فَلَا يُؤْمِنُونَ إِلَّا قَلِيلًا﴾ وە ئەگەر ئەمانە بیانوتایە: بیستمانو بەقسەت دەکەینو گوێمان لێت بوو، دەبێت چاوێکت لێمان بێت، چاکترو ڕاستربوو بۆیان. بەڵام خودا لەسەر ئەو بێ دینییەیان نەفرینی خۆی لێکردوون. لەوانە(کەمێکیان نەبێت) نایانەوێت بڕوا بێنن. واتە: دڵیان چاکەی تێناچێتو دوورن لە چاکەوە، ئەو بڕوایە وەرناگرێت کە سودو قازانجی لێ ببینن.

﴿يَا أَيُّهَا الَّذِينَ أُوتُوا الْكِتَابَ آمِنُوا بِمَا نَزَّلْنَا مُصَدِّقًا لِمَا مَعَكُمْ مِنْ قَبْلِ أَنْ نَطْمِسَ وُجُوهًا فَنَرُدَّهَا عَلَى أَدْبَارِهَا أَوْ نَلْعَنَهُمْ كَمَا لَعَنَّا أَصْحَابَ السَّبْتِ ۚ وَكَانَ أَمْرُ اللَّهِ مَفْعُولًا (٤٧) إِنَّ اللَّهَ لَا يَغْفِرُ أَنْ يُشْرَكَ بِهِ وَيَغْفِرُ مَا دُونَ ذَٰلِكَ لِمَنْ يَشَاءُ ۚ وَمَنْ يُشْرِكْ بِاللَّهِ فَقَدِ افْتَرَىٰ إِثْمًا عَظِيمًا (٤٨)﴾

---

[1] الطبري(٨/٤٣٣).

[2] الطبري(٨/٤٣٤).

[3] البقرة(١٠٤).

**بانگ کردنیان بۆ باوەڕهێنان لەگەڵ هەڕەشەلێکردندا**

خودای مەزن دەفەرمووێت: ﴿ يَٰٓأَيُّهَا ٱلَّذِينَ أُوتُوا۟ ٱلْكِتَٰبَ ءَامِنُوا۟ بِمَا نَزَّلْنَا مُصَدِّقًا لِّمَا مَعَكُم ﴾ ئەی ئەوانەی کتێبی خوداتان بۆ هاتووە بڕوا بێنن بەمەی ئێمە ناردومانەتە خوارەوە، کە بڕوای بەوانەش هەیە وان لە کتێبەکەی ئێوەدا. خودای گەورە لێرەدا فەرمان دەکات بە ئەهلی کتێب کە بڕوا بێنن بەو کتێبە( واتە قورئان کە ناردویەتی بۆ بەندەو پێغەمبەری خۆی ـﷺـ) کە هەواڵی ئەو کتێبانەی لەبەردەستیاندایە لە مزگێنیەکان تێیدایەو بە ڕاستی دەزانێت. وە هەڕەشەیان لێ دەکات ئەگەر بڕوای پێ نەهێنن دەفەرمووێت: ﴿أَن نَّطْمِسَ وُجُوهًا فَنَرُدَّهَا عَلَىٰٓ أَدْبَارِهَآ ﴾ بەرلەوەی دەمو چاویان ساف بکەینو وەك پشتی سەریان لێ بکەین. عەوفی لە ئیبنو عەباسەوە وتی: ﴿نَّطْمِسَ ﴾ واتە: کوێری بکەین. دەمو چاویان بخەینە پشتی سەریان بە پشتدا بڕۆن بەڕێوە[1] قەتادەو عوتبەی عوفیش هەر وایان وتووە[2] ئەم هەڕەشەیە توندو بەهێزترە لە تۆڵە لێ سەندنو سزادان. ئەمە نمونەیەکە کە خودای مەزن بۆیان دێنێتەوە لەسەر لادانیان لە ڕێچکەی هەقو گەڕانەوەیان بەرەو ناهەقی پەشیمان بوونەوەیان لە یەکتاپەرستیو پەلە گەڕانەوەیان بەرەودوا بۆ ڕێگا پڕوپوچەکان. وەك هەندێك لە زانایان لەم ئایەتەدا کە خودای گەورە دەفەرمووێت: ﴿جَعَلْنَا فِىٓ أَعْنَٰقِهِمْ أَغْلَٰلًا فَهِىَ إِلَى ٱلْأَذْقَانِ فَهُم مُّقْمَحُونَ ﴿٨﴾ وَجَعَلْنَا مِنۢ بَيْنِ أَيْدِيهِمْ سَدًّا وَمِنْ خَلْفِهِمْ سَدًّا ﴾[3] ئێمە ملیان دەخەینە ناو زنجیرەوەو وە توند دەیبەستین کە ناتوانن بە هیچ لایەکدا سەر بجولێننو بەربەستێکمان لە پێشیان داناوەو بەربەستێکیش لە پشتیانەوە. ئەمە نمونەیەکە کە خودای مەزن هێناویەتیەوە بۆیان لەسەر گومراییانو ڕێگریيان لە ڕێی ڕاست. پاشان خودای گەورە دەفەرمووێت: ﴿أَوْ نَلْعَنَهُمْ كَمَا لَعَنَّآ أَصْحَٰبَ ٱلسَّبْتِ ﴾ یان نەفرینیان لێ بکەین وەك چۆن نەفرینمان کرد لەوانەی کە شەممەیان شکاند. واتە: ئەوانەی کە دەستدرێژیان کرد لە شەممەکەیاندا بە فێڵو گزی ڕاوەماسییان دەکرد. ڕوویان گۆڕابوو بە ڕووی مەیمونو بەراز. بەسەرهاتەکەیان بەتەواوی لە سورەتی(الاعراف) دا باسدەکرێت. پاشان خودای گەورە دەفەرمووێت: ﴿وَكَانَ أَمْرُ ٱللَّهِ مَفْعُولًا ﴾ خودا فەرمان بە هەرچی بدات هەر وەدی دێت. کەس ناتوانێت دژایەتی بکاتو ببێتە ڕێگری.

---

[1] الطبري(٨/٤٤٠).

[2] الطبري(٨/٤٤١).

[3] يس(٨– ٩).

## خودا هەرگیز لە هاوبەشی دانان بۆی خۆش نابێت مەگین بە تەوبەکردن

پاشان خودای مەزن هەواڵی داوە فەرموویەتی کە: ﴿إِنَّ ٱللَّهَ لَا يَغۡفِرُ أَن يُشۡرَكَ بِهِۦ وَيَغۡفِرُ مَا دُونَ ذَٰلِكَ لِمَن يَشَآءُ﴾ خودا لەوانە خۆش نابێت کە هاوبەشی بۆ دادەنێن. جگە لەوەی هەرکەسێك خودا مەیلی لێ بێت، لێی دەبورێت. واتە: ئەوکەسەی مردو هاوبەشی بۆ خودا دانابوو لێی خۆش نابێت جگە لەوەی هەرکەسێك لە عەبدەکانی گوناهی هەبێت، مەیلی لێ بێت عەفوی دەکات. ئیمامی ئەحمەد ڕیوایەتی کردووە لە ئەبو زەڕەوە لە پێغەمبەری خوداوە(ﷺ) کە فەرموویەتی:(خودای گەورە دەفەرموێت: ئەی بەندەکەم هەتا من بپەرستی‌و لێم پاڕابیتەوە، منیش لێت دەبورم لەو شتانەی کە تۆ کردووتە. ئەی بەندەکەم گەر پێم گەیشتی بە ئەندازەی(قورسی) زەوی تاوانەوە، کە شەریکت بۆ دانەنابم. بە ئەندازەی قورسی(زەوی) بە لێبوردنەوە لێت پێت دەگەم)[1] بە شێوەیە تەنیا ئیمامی ئەحمەد ئەم فەرموودەی هێناوە. دیسان ئیمامی ئەحمەد ڕیوایەتی کردووە ە ئەبو زەڕەوە وتی: چووە خزمەتی پێغەمبەر(ﷺ) فەرمووی:(هیچ عەبدێك نیە کە بڵێت: لا اله الا الله ، لە دواییدا لەسەرئەوە بمرێت مەگین دەچێتە بەهەشتەوە) ئەبو زەڕە وتی: وتم با داوێن پیسی بکات‌و دزیش بکات؟ فەرمووی:(با داوێن پیسی بکات‌و دزیش بکات) وتم: با داوێن پیسی بکات‌و دزیش بکات؟ فەرمووی:(با داوێن پیسی بکات‌و دزیش بکات) پێغەمبەر(ﷺ) سێ جار ئەمەی دووبارە کردەوە، پاشان لە جاری چوارەمدا فەرمووی:(با ئەبو زەڕەیش پێی ناخۆش بێت لووتی بنیشێتە سەرخۆڵ) ئەبوزەڕ چووە دەرەوەو پشاکەکەی ڕادەکێشاو دەیوت: با لووتی ئەبوزەڕ بکەوێتە سەر خاك.[2] بوخاری‌و موسلمیش ڕیوایەتیان کردووە[3] بەزار ڕیوایەتی کردووە لە ئیبنو عومەرەوە وتی: ئێمە خۆمان دەگرت لە داوای لێبوردن بۆ ئەوکەسانەی کە گوناهە گەورەکانیان دەکرد هەتا بیستمان لە پێغەمبەرەکەمان(ﷺ) دەیفەرموو: خودا لەوانە خۆشنابێت کە بڵێن خودا هاوبەشی هەیە، جگە لەوە خودا هەرکەسێك مەیلی لێ بێت لێی دەبورێت. پاشان فەرمووی:(شەفاعەتی خۆم دواخستووە بۆ ئەوانەی گوناهە گەورەکانیان کردووە لە ئوممەتەکەم لە ڕۆژی قیامەتدا)[4] ﴿وَمَن يُشۡرِكۡ بِٱللَّهِ فَقَدِ ٱفۡتَرَىٰٓ إِثۡمًا عَظِيمًا﴾ ئەوکەسانەی دەڵێن: خودا هاوتای هەیە، بوختانێکی گەورەیان لە دەم دەردەچێت‌و تاوانێکی مەزن دەکەن. ئەم ئایەتە وەك

---

[1] أحمد(٥/١٥٤) فەرموودەیەکی سەحیحە.

[2] أحمد(٥/١٥٢) فەرموودەیەکی سەحیحە.

[3] فتح الباري(١٠/٢٩٤)، مسلم(١/٩٥).

[4] كشف الاستار(٤/٨٤) سەنەدەکانی باشە.

ئەو ئایەتە وایە کە خودای گەورە دەفەرموێت: ﴿إِنَّ الشِّرْكَ لَظُلْمٌ عَظِيمٌ﴾[1] شەریك بۆ خودا بڕیاردان نامەقیەکی زۆر گەورەیە. لە هەردوو سەحیحەکەدا هاتووە لە ئیبنو مەسعودەوە کە وتی: وتم: ئەی پێغەمبەری خودا(ﷺ) چ تاوانێك زۆر گەورەیە؟ فەرمووی:(هاوبەش دانێیت بۆ خودا کە ئەو تۆی دروست کردووە)[2] فەرموودەکەی بەتەواوی باس کرد.

﴿أَلَمْ تَرَ إِلَى الَّذِينَ يُزَكُّونَ أَنفُسَهُم ۚ بَلِ اللَّهُ يُزَكِّي مَن يَشَاءُ وَلَا يُظْلَمُونَ فَتِيلًا (٤٩) انظُرْ كَيْفَ يَفْتَرُونَ عَلَى اللَّهِ الْكَذِبَ ۖ وَكَفَىٰ بِهِ إِثْمًا مُّبِينًا (٥٠) أَلَمْ تَرَ إِلَى الَّذِينَ أُوتُوا نَصِيبًا مِّنَ الْكِتَابِ يُؤْمِنُونَ بِالْجِبْتِ وَالطَّاغُوتِ وَيَقُولُونَ لِلَّذِينَ كَفَرُوا هَٰؤُلَاءِ أَهْدَىٰ مِنَ الَّذِينَ آمَنُوا سَبِيلًا (٥١) أُولَٰئِكَ الَّذِينَ لَعَنَهُمُ اللَّهُ ۖ وَمَن يَلْعَنِ اللَّهُ فَلَن تَجِدَ لَهُ نَصِيرًا (٥٢) أَمْ لَهُمْ نَصِيبٌ مِّنَ الْمُلْكِ فَإِذًا لَّا يُؤْتُونَ النَّاسَ نَقِيرًا (٥٣)﴾

**زەمی جولەکەو نەفرین لێکردنیان لەسەر ئەوەی خۆیان بەباش دەزانن و بڕوایان بە بت و تاغوت هێناوەو بە پێچەوانەی ڕاستەڕێی و بڕوا بە خودا دەڕۆن بەڕێوە**

خودای مەزن دەفەرموێت: ﴿أَلَمْ تَرَ إِلَى الَّذِينَ يُزَكُّونَ أَنفُسَهُم﴾ تۆ ئەوانەت نەدیوە کە هەر خۆیان پاکانە بۆ خۆیان دەکەن؟ حەسەن و قەتادە وتیان: ئەم ئایەتە هاتووەتە خوارەوە لەسەر جوولەکەو گاورەکان کاتێك وتیان: ئێمە فەرزەندانی خوداو خۆشەویستانی ئەوین.[3] ئیبنو زەید وتی: ئەم دوو ئایەتە لەسەر جوولەکەو مەسیحیەکان هاتووەتە خوارەوە خودای مەزن لەسەر زمانی ئەوان فەرموویەتی: ﴿نَحْنُ أَبْنَاءُ اللَّهِ وَأَحِبَّاؤُهُ﴾[4] ئێمە فەرزەندانی خوداو خۆشەویستانی ئەوین. وە فەرموویەتی: ﴿لَن يَدْخُلَ الْجَنَّةَ إِلَّا مَن كَانَ هُودًا أَوْ نَصَارَىٰ﴾[5] وتیان: تەنیا مووسایی یان عیسایی دەچنە بەهەشت[6] هەر بۆیە خودای گەورە دەفەرموێت: ﴿بَلِ اللَّهُ يُزَكِّي مَن يَشَاءُ﴾ بەڵکو خودا مەیلی لەهەر کەسێك بوبێت هەڵی دەبژێرێت(تەزکیە دەکات) واتە: هەموو شتێك دەگەڕێتەوە بۆلای خودا لەو بارەیەوە، هەر ئەویش چاك ئاگاداری شتە ڕاست و دروست و شاراوەکانە. پاشان خودای گەورە

---

[1] لقمان(١٣).

[2] فتح الباری(٨/٣٥٠)، مسلم(١/٩٠).

[3] الطبری(٨/٤٥٢).

[4] المائدة(١٨).

[5] البقرة(١١١).

[6] الطبری(٨/٤٥٣).

دەفەرمووێت: ﴿وَلَا يُظْلَمُونَ فَتِيلًا﴾ بە ئەندازەی باریکی پێستی ناوکە خورماش ناهەقی لە هیچ کەسێك ناکرێت. واتە: پاداشتو چاکەی هیچ کەس پشتگوێ ناخرێت. با بە ئەندازەی قورسو باریکی پێستی ناوکە خورمایەکیش بێت. ئیبنو عەبباسو موجاهدو عیکرمەو عەتاو حەسەنو قەتادەو کەسانی تریش لە زانایانی پێشینە وتوویانە: ﴿فَتِيلًا﴾ ئەو پێستە باریکەیە کەلە ناو درزی ناوکە خورمادایە.[1]

﴿انظُرْ كَيْفَ يَفْتَرُونَ عَلَى اللَّهِ الْكَذِبَ﴾ بڕوانە درۆی چۆن بەدەم خوداوە هەڵدەبەستن. کە چۆن پاکانە بۆ خۆیان دەکەنو دەڵێن: ئێمە فەرزەندانو خۆشەویستانی خوداین. وە دەڵێن: ﴿لَن يَدْخُلَ الْجَنَّةَ إِلَّا مَن كَانَ هُودًا أَوْ نَصَارَىٰ﴾[2] تەنیا مووسایىو عیسایی دەچنە بەهەشت. وە دەڵێن: ﴿لَن تَمَسَّنَا النَّارُ إِلَّا أَيَّامًا مَّعْدُودَاتٍ﴾[3] ئێمە ئەگەر بشمانخەنە ناو ئاگر چەند ڕۆژێك زیاتری پێ ناچێت. ئەوانە پشتیان بەئاکاری بابو باپیرە چاکەکانیان بەستووە. خوداش وا بڕیاری داوە کە ئاکاری باب و باپیران دابەش ناکرێت بەسەر فەرزەندەکانیانداو هیچ سودێکی بۆیان نیە ﴿تِلْكَ أُمَّةٌ قَدْ خَلَتْ لَهَا مَا كَسَبَتْ وَلَكُم مَّا كَسَبْتُمْ﴾[4] ئەوانە کۆمەڵانێك بوون کە ڕابووردوون کردەوەیان بۆ خۆیانە، ئێوەش کردەوەی خۆتان بۆ خۆتانە. پاشان خودای گەورە لێرەدا دەفەرمووێت: ﴿وَكَفَىٰ بِهِ إِثْمًا مُّبِينًا﴾ تاوان لەمە ئاشکراتر(نەبووەو) نابێت. بەسە ئیتر واز لەم کردارە ناشرینو درۆو بوختانە ئاشکرایانە بێنن. پاشان خودای گەورە دەفەرمووێت: ﴿أَلَمْ تَرَ إِلَى الَّذِينَ أُوتُوا نَصِيبًا مِّنَ الْكِتَابِ يُؤْمِنُونَ بِالْجِبْتِ وَالطَّاغُوتِ﴾ ئایا ئەوانەت نەدیووە کەوا بەشێك لە کتێبیان پێدراوەو بە بتو تاغوت بڕوایان هێناوە؟ موحەممەدی کوڕی ئیسحاق لە حەسەنی کوڕی فائیدەوە لە عومەری کوڕی خەتابەوە کە وتویەتی:(الجبت) واتە: جادوو. (الطاغوت) واتە: شەیتان.[5] ئەبونەسرئیسماعیلی کوڕی حەمادی جەوهەری لە کتێبەکەیدا (الصحاح) تی: (الجبت) وتەیەکە بۆبت و فاڵچیو جادووگەرو شێوەی ئەمانە بەکاردەهێنرێت. ئیبنو ئەبی حاتەم ڕیوایەتی کردووە لە جابری کوڕی عەبدوڵڵاوە کە پرسیاری

---

[1] الطبری(٨/٤٥٨/٤٥٩).

[2] البقرة(١١١).

[3] ال عمران(٢٤).

[4] البقرة(١٣٤).

[5] الطبري(٨/٤٦٢).

دەربارەی تاغووت لێکرا وتی: ئەو فاڵچیانەن شەیاتینەکان دادەبەزنە لایان[1] موجاهد وتی: تاغووت ئەو شەیتانەیە لەوێنەی مرۆڤدایە خەڵکی کاوباریان دەبەنەلای و ئەو خاوەنی بڕیارەکانیانە[2]. ئیمامی مالیکیش دەڵێت: تاغووت، هەر شتێکە جگە لە خودای گەورە بپەرسترێت.

## خودانەناسان هیچ ڕێزێکیان بەسەر موسڵمانانەوە نیە

خودای مەزن دەفەرموێت: ﴿وَيَقُولُونَ لِلَّذِينَ كَفَرُوا۟ هَٰٓؤُلَآءِ أَهْدَىٰ مِنَ ٱلَّذِينَ ءَامَنُوا۟ سَبِيلًا﴾ دەڵێن: ڕێی خودانەناسەکان لە ڕێگەی بڕوادارەکان ڕێك و ڕاسترە. واتە: بەهۆی نەفامی و لاوازی ئاینیانەوە ڕێزی خودانەناسان دەدەن بەسەر موسڵماناندا. باوەڕیان نیە بەو کتێبەی کە لەبەردەستیاندایە. ئیبنو ئەبی حاتەم ڕیوایەتی کردووە لە عیکرەمەوە وتی: حویەی کوڕی ئەختەب(حُيَي بن أخطب) کەعبی کوڕی ئەشرەف هاتن بۆلای خەڵکی مەککە پێیان وتن: ئێوە ئەهلی کتێب و زانان، باسی ئێمەو موحەممەدمان بۆ بکەن، وتیان: ئێوە کێن و موحەممەد کێیە؟ وتیان ئێمە پەیوەندی خزمایەتی بەجێ دێنین و وشتری پشت بەرزو گەورە سەردەبڕین و ئاو دەدەین بە خەڵکی لەگەڵ شیرو تاوانبار بەردەدین و ئاودەدەین بە حاجیان. موحەممەدیش کەسێکە هەرزەو تازەپێگەیشتووە پەیوەندی خزمایەتی بپچڕیوین. دزەکانی حاجیان لە بەنی غەفار شوێنی کەوتوون.ئێمە چاکین یان ئەو؟ وتیان: ئێوە چاکن و ڕێگەی ئێوە لە ڕێگەی ئەو ڕاست و دروسترە. خودای گەورە ئەم ئایەتەی ناردەخوارەوە: ﴿أَلَمْ تَرَ إِلَى ٱلَّذِينَ أُوتُوا۟ نَصِيبًا مِّنَ ٱلْكِتَٰبِ﴾ ئەمە ڕیوایەت کراوە لە ئیبنو عەباس و کۆمەڵێك لە زانایانی ترەوە لە زانایانی پێشینە(سلف).

## نەفرینی خودا لەو جولەکانە لەبەر داواکردنی یارمەتیان لە بت پەرستان

خودای مەزن دەفەرموێت: ﴿أُو۟لَٰٓئِكَ ٱلَّذِينَ لَعَنَهُمُ ٱللَّهُ ۖ وَمَن يَلْعَنِ ٱللَّهُ فَلَن تَجِدَ لَهُۥ نَصِيرًا﴾ ئەوانە وەبەر نەفرینی خودا کەوتن، هەرکەسێك خودا نەفرینی لێ بکات هیچ کەس بەهانایانەوە نایەت. ئەمە نەفرین کردنە لەو جولەکانەو هەواڵدانە بەوەی کە هیچ کەس بەهانایانەوە نایەت نە لە دونیاو نە لە ڕۆژی دواییدا. چونکە ئەوانە چوون داوای یارمەتیان لە بت پەرستەکان کرد، هەر بۆیە ئەوەشیان پێ وتن:(وتیان بە بت پەرستەکان ئێوە لە موحەممەد چاکترن) هەتا دڵیان بۆلای خۆیان ڕابکێشن و یارمەتیان بدەن. ئەوانش داواکەیان قبوڵ کردن و لەگەڵیا هاتن بۆ ڕۆژی ئەحزاب. ئەوەبوو پێغەمبەری خودا(ﷺ) هاوەڵەکانی چاڵیان(خەندەقیان) لێدا بەدەوری مەدینەداو خودا شەڕەکەی لێ

---

[1] ابن أبي حاتم(٩٩٤/٣/١٤).

[2] الطبري(٤٦٢/٨).

دوورخستنەوە وەك خودای گەورە دەفەرمووێت: ﴿وَرَدَّ اللَّهُ الَّذِينَ كَفَرُوا بِغَيْظِهِمْ لَمْ يَنَالُوا خَيْرًا وَكَفَى اللَّهُ الْمُؤْمِنِينَ الْقِتَالَ وَكَانَ اللَّهُ قَوِيًّا عَزِيزًا﴾[1] خودا خودانەناسانی (لەگەڵ ئەو ڕقەی كە بوویان) كشاندەوەو هیچ بەهرەشیان دەست نەكەوت. خودا خاوەن باوەڕانی پاراست لەو جەنگە، خودا خاوەن توانای بە دەستەڵاتە.

﴿أَمْ لَهُمْ نَصِيبٌ مِنَ الْمُلْكِ فَإِذًا لَا يُؤْتُونَ النَّاسَ نَقِيرًا (٥٣) أَمْ يَحْسُدُونَ النَّاسَ عَلَى مَا آتَاهُمُ اللَّهُ مِنْ فَضْلِهِ فَقَدْ آتَيْنَا آلَ إِبْرَاهِيمَ الْكِتَابَ وَالْحِكْمَةَ وَآتَيْنَاهُمْ مُلْكًا عَظِيمًا (٥٤) فَمِنْهُمْ مَنْ آمَنَ بِهِ وَمِنْهُمْ مَنْ صَدَّ عَنْهُ وَكَفَى بِجَهَنَّمَ سَعِيرًا (٥٥)﴾

**ڕژدی و چروكی جوولەكە و ئیرەییيان (حەسوديان)**

خودای مەزن دەفەرمووێت: ﴿أَمْ لَهُمْ نَصِيبٌ مِنَ الْمُلْكِ فَإِذًا لَا يُؤْتُونَ النَّاسَ نَقِيرًا﴾ ئایا ئەوانە بەشیان بەو موڵكەوە هەیە؟ ئەگەر بیشیان بێت ئەوەندەی توێكڵی دەنكە خورمایەك سودیان بۆ مەردووم نیە. ئەمە ئیستفهامی ئینكاریە، واتە: هیچ بەشێكیان لەو موڵكەدا نیە، پاشان وەسفی كردن بە ڕژدو چروكو دەفەرمووێت: ﴿فَإِذًا لَا يُؤْتُونَ النَّاسَ نَقِيرًا﴾ واتە: ئەگەر بەشیان بەو موڵكەوە بووایەو بەدەستی ئەوان بووایە بەشی هیچ كەسیان لێ نەدەدا (بەتایبەتی موحەممەد(ﷺ))، واتە: بە ئەندازەی ئەوەی شوێنی توێكڵی دەنكە خورمایەك پڕبكاتەوە بەكەسیان نەدەدا. ئیبنو عەبباسو زۆر كەسی تریش دەڵێن:(نقیر) ئەو شوێنەیەكە لەناو دەنكی خورمادایە. ئەم ئایەتە وەك ئەم ئایەتە وایە كە خودای گەورە فەرموویەتی: ﴿قُلْ لَوْ أَنْتُمْ تَمْلِكُونَ خَزَائِنَ رَحْمَةِ رَبِّي إِذًا لَأَمْسَكْتُمْ خَشْيَةَ الْإِنْفَاقِ﴾[2] بڵێ: ئەگەر ئێوە خاوەنی گەنجینەكانی بەزەیی پەروەردگاری من بوونایە هێشتا دەست ڕژدیتان دەكرد. مرۆڤ چاوچنۆكو چروكە. واتە: لەترسی ئەوەی نەوەكو تەواو ببێتو نەمێنێتو لەدەستیان بچێت. هەرگیز عەقڵ نایسەلمێنێت تەواو ببێت. ئەمەش هەر لەبەر ڕژدیو چروكیتانە. هەر بۆیە خودای گەورە دەفەرمووێت: ﴿وكان الانسان قتوراً﴾ مرۆڤ هەمیشە چاوچنۆكو چروكە. پاشان دەفەرمووێت: ﴿أَمْ يَحْسُدُونَ النَّاسَ عَلَى مَا آتَاهُمُ اللَّهُ مِنْ فَضْلِهِ﴾ یان ئەوانەی ئیرەیی بەمانە دەبەن كەخودا چاكەی لەگەڵ كردوون؟ واتە: ئیرەیی(حەسودی) بە پێغەمبەر(ﷺ) دەبەن لەسەر چاكە گەورەیە لەگەڵی كردووە كە كردویەتی بە پێغەمبەر(ﷺ)، هەر لەبەر ئەو حەسودیەیە كە بڕوای پێ ناهێنن،

---

[1] الاحزب(٢٥).

[2] الاسراء(١٠٠).

لەبەرئەوەی لە عەرەبەو لە نەوەی ئیسرائیل نیە. تەبەرانی ڕیوایەتی کردووە لە ئیبنو عەبباسەوە لەم ئایەتەدا کە خودای گەورە دەفەرمووێت: ﴿ أَمْ يَحْسُدُونَ النَّاسَ ﴾ وتی: دەڵێن ئێمە خەڵکێکین جیاین لە خەلکی تر[1] خودای مەزن دەفەرمووێت: ﴿فَقَدْ ءَاتَيْنَآ ءَالَ إِبْرَٰهِيمَ ٱلْكِتَٰبَ وَٱلْحِكْمَةَ وَءَاتَيْنَٰهُم مُّلْكًا عَظِيمًا﴾ خۆ دیارە ئێمە بە نەوەی ئیبراهیم کتێبو لە کارزانیمان داو دەستەڵاتێکی گەورەشمان پێ سپاردن. واتە: ئێمە پێغەمبەرایەتیمان دا بە نەوەی ئیسرائیل کە لە بەرەی ئیبراهیمنو کتێبمان بۆ ناردن بە بڕیاری ئەو داوەریمان لە نێوانیاندا دەکردنو هەندێکیشمان کردە خاوەن دەستەڵاتی گەورە لەگەڵ ئەوەیشدا ﴿فَمِنْهُم مَّنْ ءَامَنَ بِهِۦ وَمِنْهُم مَّن صَدَّ عَنْهُ﴾ هەندێك بڕوایان پێی هێناو هەندێکی تر ڕوویان لێ وەرگێڕا. واتە: پشتیان تێکردو بڕوایان پێ نەهێناو ڕێگریشیان لە خەڵکی دەکرد بڕوا بێنێت. هەر لە خۆشیان بوو لە نەوەی ئیسرائیل، دژایەتیان دەکرد. دەبێت چی بکەن ئەی موحەممەد دەربارەی تۆ کە لە نەوەی ئیسرائیل نیت؟ موجاهد وتی: ﴿فَمِنْهُم مَّنْ ءَامَنَ بِهِۦ﴾ هەندێك لەوانە بڕوایان بە موحەممەد هێناو ﴿وَمِنْهُم مَّن صَدَّ عَنْهُ﴾ هەندێکیان بوونە ڕێگری[2] ئەوانەیان کە خودانەناس بوون بێ دینەکەیان زۆر زیاتربوو، زۆر دوور دەکەوتنەوە لەو پەیامە هەقو ئاشکرای کە تۆی پێ ڕەوانەکرابوو. هەربۆیە خودای گەورە هەڕەشەیان لێ دەکاتو دەفەرمووێت: ﴿وَكَفَىٰ بِجَهَنَّمَ سَعِيرًا﴾ کە ئەوانە کڵپەی جەهەننەم(بەشیانەو) بەسیشیانە. واتە: ئاگری جەهەننەم چاکترین تۆڵەیە بۆیان لەسەر ئەو بێ دینیو لاساریو دژیەتی کردنی کتێبەکانی خوداو پێغەمبەرەکانی.

﴿ إِنَّ ٱلَّذِينَ كَفَرُوا۟ بِـَٔايَٰتِنَا سَوْفَ نُصْلِيهِمْ نَارًا كُلَّمَا نَضِجَتْ جُلُودُهُم بَدَّلْنَٰهُمْ جُلُودًا غَيْرَهَا لِيَذُوقُوا۟ ٱلْعَذَابَ ۗ إِنَّ ٱللَّهَ كَانَ عَزِيزًا حَكِيمًا ﴿٥٦﴾ وَٱلَّذِينَ ءَامَنُوا۟ وَعَمِلُوا۟ ٱلصَّٰلِحَٰتِ سَنُدْخِلُهُمْ جَنَّٰتٍ تَجْرِى مِن تَحْتِهَا ٱلْأَنْهَٰرُ خَٰلِدِينَ فِيهَآ أَبَدًا ۖ لَّهُمْ فِيهَآ أَزْوَٰجٌ مُّطَهَّرَةٌ ۖ وَنُدْخِلُهُمْ ظِلًّا ظَلِيلًا ﴿٥٧﴾ ﴾

## سزای ئەوکەسانەی بڕوایان بە کتێبی خوداو پێغەمبەرەکەی نیە

خودای مەزن باسی سزای ئەوکەسانە دەکات لە ناو ئاگری جەهەننەمدا کە بڕوایان نەبووە بە نیشانەکانی خوداو ببوونە ڕێگرو لە ڕێگەی بانگەوازەکەیداو دەفەرمووێت: ﴿ إِنَّ ٱلَّذِينَ كَفَرُوا۟ بِـَٔايَٰتِنَا سَوْفَ نُصْلِيهِمْ نَارًا ﴾ ئەوکەسانەی بڕوایان بە نشانەکانی ئێمە نەبوو، بەمزوانە دەیانخەینە ناو ئاگر،

---

[1] الطبري(١١/١٤٦).

[2] الطبري(٨/٤٨٢).

ئاگرێك كە هەموو ئەندامەكانی لاشەیان دادەپۆشێت‌و بەردەوام جەزرەبە دەدرێن‌و سوكایەتیان پێدەكرێت لەناویدا. ﴿كُلَّمَا نَضِجَتۡ جُلُودُهُم بَدَّلۡنَٰهُمۡ جُلُودًا غَيۡرَهَا لِيَذُوقُواْ ٱلۡعَذَابَ﴾ كاتێك كە پێستیان سوتاو برژا پێستی تریان بۆ دەگۆڕین تاكو زیاتر ئازار بچێژن. ئیبنو ئەبی حاتەم ڕیوایەتی كردووە لە ئەعمەشەوە لە ئیبنو عومەرەوە وتی: كاتێك پێستەكانیان برژا، دەگۆڕێت بە پێستێكی تری سپی وەكپەڕەكانی كاغەز.[1] دیسان ئیبنو ئەبی حاتەم ڕیوایەتی كردووە لە حەسەنەوە لەم ئایەتەدا ﴿كُلَّمَا نَضِجَتۡ جُلُودُهُم﴾ هەركاتێك پێستەكانیان سوتا. وتی: لە ڕۆژێكدا حەفتا هەزار جار دەیان سوتێنن. فەزڵی كوڕی هیشام ئەمەی بۆزیادكردووە لە حەسەنەوە: هەركاتێك پێستەكانیان تەواو دەسوتێت پێیان دەوترێت: وەك خۆتان لێ ببنەوە. وەكو خۆیان لێ دێتەوە.[2] پاشان خودای گەورە دەفەرموێت: ﴿إِنَّ ٱللَّهَ كَانَ عَزِيزًا حَكِيمًا﴾ خودا خاوەن دەستەڵاتی لە كارزانە.

## باسی پاشەڕۆژی پیاوچاكان هەر بەهەشتەو خۆشگوزەرانیە لەناویدا

خودای مەزن دەفەرموێت: ﴿وَٱلَّذِينَ ءَامَنُواْ وَعَمِلُواْ ٱلصَّٰلِحَٰتِ سَنُدۡخِلُهُمۡ جَنَّٰتٖ تَجۡرِي مِن تَحۡتِهَا ٱلۡأَنۡهَٰرُ خَٰلِدِينَ فِيهَآ أَبَدٗاۖ﴾ ئەوكەسانەش خاوەن باوەڕن‌و ئاكاری چاك ڕەچاودەكەن، دەیانبەینە باغاتی وا چەندین ڕوباریان بە بەردەمدا دەڕوات‌و هەتاسەر هەر تیای دەبن. ئەمە باسی پاشەڕۆژی ئەو بەختەوەرانەیە كە لە بەهەشتی هەتا هەتاییدا كە ڕوبار بە بەردەمیدا دەڕوات لەگشت لایەكیەوە هەركاتێك ئارەزوی بكەن‌و بینەوێت هەر دەمێننەوە هەرگیز لەناوناچن‌و ناشیانەوێت لێی دەرچن. پاشان خودای گەورە دەفەرموێت: ﴿لَّهُمۡ فِيهَآ أَزۡوَٰجٞ مُّطَهَّرَةٞۖ﴾ ژنانی پاك لە گشت عەیبێكی تێدایە بۆیان. واتە: ئەو ژنانە پاكن‌و توشی خوێنی حەیزو خوێنی پاش منداڵ بوون نابن‌و دوورن لە گشت ڕەوشتێكی خراپ‌و ناشرینەوە. وەك ئیبنو عەبباس وتی: پاك‌و خاوێنن‌و دوورن لە هەموو شتێكی زیانبەخش‌و پیسەوە.[3] عەتاو حەسەن‌و زەحاك‌و نەخەعی‌و ئەبو سالح‌و عەتیە‌و سوددیش هەروایان وتووە.[4] موجاهد وتی: پاك‌و خاوێنن لە میزو حەیزو چڵم‌و بەڵغەم‌و مەنی‌و منداڵیان دەبێت. خودای گەورە دەفەرموێت: ﴿وَنُدۡخِلُهُمۡ ظِلّٗا ظَلِيلًا﴾ دەیانخەینە ناو سێبەری چڕوپڕو خۆش‌و دڵڕفێن‌و كەشخەوە. ئیبنو جەریر ڕیوایەتی كردووە لە ئەبوهورەیرەوە لە پێغەمبەرەوە(ﷺ)

---

[1] الطبري(٨/٤٨٤).

[2] الطبري(٨/٤٨٥).

[3] الطبري(١/٣٩٥).

[4] ابن أبي حاتم(١/٩٢).

فەرموویەتی:(لەناو بەهەشتدا درەختێك هەیە سوار بەژێر سێبەرەکەیدا سەد ساڵ دەڕوات نایبڕێت: کە درەختی هەرماوەیە(شجرة الخلد))[1].

﴿إِنَّ ٱللَّهَ يَأۡمُرُكُمۡ أَن تُؤَدُّواْ ٱلۡأَمَٰنَٰتِ إِلَىٰٓ أَهۡلِهَا وَإِذَا حَكَمۡتُم بَيۡنَ ٱلنَّاسِ أَن تَحۡكُمُواْ بِٱلۡعَدۡلِۚ إِنَّ ٱللَّهَ نِعِمَّا يَعِظُكُم بِهِۦٓۗ إِنَّ ٱللَّهَ كَانَ سَمِيعَۢا بَصِيرٗا ﴿٥٨﴾﴾

## فەرماندان بە جێبەجێکردنی ئەمانەت

خودای مەزن دەفەرمووێت: ﴿إِنَّ ٱللَّهَ يَأۡمُرُكُمۡ أَن تُؤَدُّواْ ٱلۡأَمَٰنَٰتِ إِلَىٰٓ أَهۡلِهَا﴾ خودا فەرمانتان پێ دەکات هەرچی ماڵی ئەمانەتە بیاندەنەوە بە خاوەنیان. وە لە فەرموودەیەکی حەسەندا هاتووە لە سەمورەوە کە پێغەمبەری خودا(ﷺ) فەرموویەتی:(ئەمانەت بدەنەوە دەستی خاوەنەکەی هەرگیز خیانەت مەکەن لەوەی خیانەتی لێکردوی) ئیمامی ئەحمەدو خاوەنی کتێبەکانی تری فەرموودەش ڕیوایەتیان کردووە[2] ئەم فەرمانە هەموو ئەو ئەمانەتە دەگرێتەوە لەسەر خەڵکی بە پێویست گیراوە لەو هەقانەی خودا بەسەر عەبدەکانیەوە لە نوێژو زەکاتو ڕۆژیو کەفارەتەکانو نەزرو ئەو شتانەی کە بە ئەمانەت لەسەر مرۆڤ دانراوەو بەندەکان لێی ئاگادار نین، وە لەو هەقانەی خەڵکی بەسەر یەکترییەوە هەیانە، وەك ڕاسپاردەو ئەو شتانەی بە ئەمانەت لەلای یەکتری دایدەنێن، بەبێ ئەوەی شایەتێك ببێت لە نێوانیاندا لەوبارەیەوە، خودای گەورە فەرمان دەکات بە دانەوەی، هەرکەسێك لە دونیا ئەوەی لەلایەتی نەیداتەوە بە خاوەنەکەی لە ڕۆژی قیامەتدا لێی دەسەندرێتەوە. وەك لە فەرموودیەکی سەحیحیدا هاتووە کە پێغەمبەری خودا(ﷺ) فەرموویەتی: (سوێند بەخودا هەموو هەقەکان دەدرێنەوە بە خاوەنەکانیان لە ڕۆژی قیامەتدا، هەتا هەقی مەڕی بێ شاخ لە مەڕی شاخدار دەسەندرێتەوە)[3] ئیبنو جەریر ڕیوایەتی کردووە لە ئیبنو جورەیمەوە لەم ئایەتەدا وتی: ئەم ئایەتە لەسەر عوسمانی کوڕی تەلحە هاتەخوارەوە، پێغەمبەری خودا(ﷺ) کلیلی کەعبەی لێ وەرگرت لە ڕۆژی فەتحی مەککەدا چووە ناو ماڵی خوداو هاتەدەرەوە ئەم ئایەتەی خوێند: ﴿إِنَّ ٱللَّهَ يَأۡمُرُكُمۡ أَن تُؤَدُّواْ ٱلۡأَمَٰنَٰتِ إِلَىٰٓ أَهۡلِهَا﴾ عوسمانی بانگ کرد بۆلای خۆیو کلیلەکەی دایەدەستی، وتی: کاتێك کە پێغەمبەری خودا(ﷺ) لە کەعبەی پیرۆز هاتەدەرەوە ئەم ئایەتەی دەخوێند: ﴿إِنَّ ٱللَّهَ يَأۡمُرُكُمۡ أَن تُؤَدُّواْ ٱلۡأَمَٰنَٰتِ إِلَىٰٓ أَهۡلِهَا﴾ عومەری کوڕی خەتاب وتی: دایكو باوکم بە قوربانی بێت، ئەم بیستووە پێش

---

[1] الطبري(٨٤٨٩).

[2] أحمد(٣/٤٢٤)، أبوداود(٣/٨٠٥)، تحفة الاحوذي(٤/٤٧٩) ترمذي بەحەسەنی داناوە.

[3] مسلم(٤/١٩٩).

ئەوە ئەم ئایەتە بخوێنێت[1] ئەمە زۆر مەشهورە کە ئەم ئایەتە لەمەدا هاتووەتەخوارەوە. خۆ ئەگەر لەسەر ئەمە هاتبێتە خوارەوە یان نەهاتبێت فەرمانەکە گشتگیرە، هەر بۆیە ئیبنو عەبباس‌و موحەممەدی کوڕی حەنیفە(الحنیفة) وتیان: ئەم بڕیارە بۆ پیاوی چاك‌و خراپیشە، واتە: بڕیارەکە بۆ هەموو کەسە.

## فەرماندان بە دادپەروەری لە دادگادا

خودای مەزن دەفەرموێت: ﴿وَإِذَا حَكَمْتُم بَيْنَ النَّاسِ أَن تَحْكُمُوا بِالْعَدْلِ﴾ هەرکاتێك دادوەریتان کرد لە نێوان خەڵکیدا، با لاگیری و یەکسانی دادوەری بکەن. لەبەر ئەمەیە موحەممەدی کوڕی کەعب‌و زەیدی کوڕی ئەسلەم‌و شەهری کوڕی حەوشەب وتویانە: ئەم ئایەتە لەسەر فەرمانڕەواکان هاتووەتەخوارەوە[2] واتە: ئەوکەسانەی کاروباری خەڵکی بەڕێوەدەبەن. وە لەم فەرموودەیەدا هاتووە:(خودا پشتگیری لە فەرمانڕەوا(دادوەر) دەکات هەتا ناهەقی نەکات، هەرکاتێك ناهەقی کرد خودا ئەو دادوەریە دەگێڕێتەوە لای خۆی)[3] لە ئەسەردا(الاثر) هاتووە:(دادگەری ڕۆژێك(عدل) وەك عیبادەتی چل ساڵ وایە)[4] خودای گەورە دەفەرموێت: ﴿إِنَّ اللَّهَ نِعِمَّا يَعِظُكُم بِهِ﴾ خودا زۆر باش ئامۆژگاریتان دەکات. واتە: فەرمانتان پێدەکات کە ئەمانەتەکان دەست خاوەنی خۆی‌و دادوەری بە یەکسانی لە نێوان خەڵکیدا بەجێ بێنن‌و ئەرکە شەرعیەکان بە تەواوەتی‌و بێ کەم‌و کوڕی جێبەجێ بکەن. پاشان دەفەرموێت: ﴿إِنَّ اللَّهَ كَانَ سَمِيعًا بَصِيرًا﴾ خودا هەموو شتێك دەبیستێ‌و هەموو شتێکیش دەبینێت. واتە: قسەکانتان دەبیستێ و کردارەکانیشتان دەبینێت.

﴿يَا أَيُّهَا الَّذِينَ آمَنُوا أَطِيعُوا اللَّهَ وَأَطِيعُوا الرَّسُولَ وَأُولِي الْأَمْرِ مِنكُمْ ۖ فَإِن تَنَازَعْتُمْ فِي شَيْءٍ فَرُدُّوهُ إِلَى اللَّهِ وَالرَّسُولِ إِن كُنتُمْ تُؤْمِنُونَ بِاللَّهِ وَالْيَوْمِ الْآخِرِ ۚ ذَٰلِكَ خَيْرٌ وَأَحْسَنُ تَأْوِيلًا ﴿٥٩﴾﴾

## فەرماندان بە گوێڕایەلی کاربەدەست لە چاکەدا

خودای مەزن دەفەرموێت: ﴿يَا أَيُّهَا الَّذِينَ آمَنُوا أَطِيعُوا اللَّهَ وَأَطِيعُوا الرَّسُولَ وَأُولِي الْأَمْرِ مِنكُمْ﴾ ئەی کۆمەڵی خاوەن باوەڕان بە فەرمانی خوداو کاربەدەستانی خۆتان بن. بوخاری ڕیوایەتی کردووە لە ئیبنو عەبباسەوە لەم ئایەتەدا: ﴿وَأَطِيعُوا الرَّسُولَ وَأُولِي الْأَمْرِ مِنكُمْ﴾ وتی: ئەم ئایەتە

---

[1] الطبري(٨/٤٩٢).

[2] الطبري(٨/٤٩٠).

[3] ابن ماجة(٢/٧٧٥).

[4] الكنز(٦/١٢).

لەسەر عەبدوڵڵای كوڕی حوزافەی كوڕی قەیسی عەدی هاتەخوارەوە، كاتێك پێغەمبەری خودا(ﷺ) بە سوپایەكەوە(سرية) ناردنی[1] زانایانی فەرموودەش ڕیوایەتیان كردووە جگە لە ئیبنو ماجە[2] تیرمیزی وتی: فەرموودەیەكی حەسەنو غەریبە. ئیمامی ئەحمەد ڕیوایەتی كردووە لە عەلیەوە(ڕەزای خودای لێ بێت) وتی: پێغەمبەری خودا(ﷺ) سریەیەكی نارد پیاوێكی ئەنساری كردە بەرپرسیان، كاتێك كە دەرچوونو ویستی تاقیان بكاتەوە پێی وتن: ئایا پێغەمبەری خودا(ﷺ) فەرمانی پێ نەداون گوێڕایەڵی من بكەن؟ وتیان: بەڵێ، وتی: دارم بۆ كۆبكەنەوە پاشان داوای ئاگری كردو ئاگری لە دارەكان بەردا، پاشان وتی: بڕیارمداوە دەبێت بچینە ناو ئەو ئاگرە. وتی: خەڵكەكە ویستیان بچنە ناوی، لاوێكیان لەناودابوو پێی وتن: بێگومان ئێوە ڕاتان كرد بۆلای پێغەمبەر(ﷺ) لە ترسی ئاگر. پەلە مەكەن هەتا دەگەنە لای پێغەمبەری خودا(ﷺ) ئەگەر فرمانی پێكردن بچنەناوی ئەوا بڕۆنە ناوی. وتی: گەڕانەوە بۆلای پێغەمبەری خودا(ﷺ) بۆیان باسكرد پێغەمبەر(ﷺ) پێی وتن:(ئەگەر بڕۆیشتنایەتە ناوی هەرگیز لێی نەدەهاتنەدەرەوە، بەڵكو گوێڕایەڵی تەنیا بۆ چاكەیە)[3] لە هەردوو سەحیحەكەشدا هاتووە[4] ئەبو داود ڕیوایەتی كردووە لە عەبدوڵای كوڕی عومەرەوە لە پێغەمبەری خودا(ﷺ) فەرمووی:(پێویستە كەسی موسڵمان گوێڕایەڵو ملكەچ بێت لەو شتەدا پێی خۆشە یان پێی ناخۆشە بەمەرجێك فەرمانی پێ نەدرێت بە تاوان، ئەگەر فەرمانی پێدرا بە تاوان ئەوا نەگوێڕایەل بێت نە ملكەچ)[5] لە هەردوو سەحیحەكەدا هاتووە. لە عوبادەی كوڕی سامیتەوە وتی: پەیمانماندا بە پێغەمبەری خودا(ﷺ) لەسەر گوێڕایەڵیو ملكەچی لە خۆشیمانو لە ناخۆشیماندا، لە تەنگانەمانو لە ئاسودەییماندا، با كاربەدەستانیش هەندێك مافمان ببەن بۆ خۆیان. پەیمانماندا كە ململانێ نەكەین لەگەڵ كەسێك كە شایستەی فەرمانڕەوایی بێت. پێغەمبەری خودا(ﷺ) فەرمووی:(مەگین كوفرێكی ئاشكرا ببینن، بەڵگەتان لەلای خوداوە هەبێت لەسەری)[6] وە لە فەرموودەیەكی تردا لە ئەنەسەوە كە پێغەمبەری خودا(ﷺ) فەرموویەتی:(گوێڕایەڵو ملكەچ بن، ئەگەر بەندەیەكی حەبەشی كرا بە كاربەدەست بەسەرتانەوە كە سەریشی وەك مێوژ وابێت) بوخاری ڕیوایەتی كردووە[7] لە

---

[1]

[2]

[3] أحمد(٨٢/١) فەرموودەیەكی سەحیحە.

[4] فتح الباری(٦٥٥/٧)، مسلم(١٤٦٩/٣).

[5] أبو داود(٢٦٢٦)، البخاری(٧١٤٤)، مسلم(١٨٣٩).

[6] فتح الباری(٢٠٤/١٣)، مسلم(٤٧٠/٣).

[7] فتح الباری(١٣٠/١٣).

ئوممولحوسەینەوە دەڵێت: لە دایە گەورەمەوە بیستم دەیوت: بیستوویەتی لە پێغەمبەری خوداوە(ﷺ) لە حەجیماڵئاواییدا(حج الوداع) وتاری دەداو دەیفەرموو:(ئەگەر بەندەیەك کرا بە فەرماندە بەسەرتانەوە بە کتێبی خودا سەرکردایەتی دەکردن، گوێڕایەڵو ملکەچی بن) موسلیم ڕیوایەتی کردووە[1] وە لە ڕیوایەتێکی تر هاتووە: (با بەندەیەکی حەبەشی کلكو گوێ براویش بێت) وە لەم فەرموودە سەحیحەدا کە بوخاریو موسلیم ڕیوایەتیان کردووە لە ئەبوهورەیرەوە لە پێغەمبەری خوداوە(ﷺ) کە فەرموویەتی: (هەرکەسێك گوێڕایەڵی من بکات ئەوا گوێڕایەڵی خودای کردووە، هەرکەسێك سەرپێچی من بکات ئەوا سەرپێچی خودای کردووە، هەرکەسێك گوێڕایەڵی فەرمانڕەواکەی بکات، ئەوا گوێڕایەڵی منی کردووە، هەرکەسێك سەرپێچی فەرمانڕەواکەی بکات ئەوا سەرپێچی منی کردووە)[2] هەربۆیە خودای گەورە دەفەرموێت: ﴿أَطِيعُوا۟ ٱللَّهَ وَأَطِيعُوا۟ ٱلرَّسُولَ وَأُو۟لِى ٱلْأَمْرِ مِنكُمْ﴾ واتە: شوێنی کتێبەکەی من بکەونو سوننەتەکانی پێغەمبەر(ﷺ) بەجێ بێننو گوێڕایەڵی فەرمانڕەواکانتان بکەنو ملکەچیان بن لە گوێڕایەڵی فەرمانی خودا، نەك لەسەرپێچی کردنی خودادا، چونکە گوێڕایەڵی بۆ هیچ دروستکراوێك ناکرێت لەسەرپێچی کردنی خودادا. وەك لە پێشەوە لەو فەرموودە سەحیحەدا باسکرا. بەڵکو گوێڕایەڵی تەنیا بۆچاکەیە[3].

## فەرماندان بە گەڕانەوە بۆ قورئانو سوننەت لە کاتی ناکۆکیدا

خودای مەزن دەفەرموێت: ﴿فَإِن تَنَٰزَعْتُمْ فِى شَىْءٍ فَرُدُّوهُ إِلَى ٱللَّهِ وَٱلرَّسُولِ﴾ هەرکاتێك لەسەر شتێك پێکنەهاتن کێشەی خۆتان بگێڕنەوە بۆلای خوداو پێغەمبەرەکەی، موجاهدو کەسانی تریش لە زانایانی پێشینە(السلف) وتویانە: واتە بۆ قورئانو سوننەتی پێغەمبەرەکەی[4] ئەمەش فەرمانێکە لەلای خودای مەزنەوە کە هەرشتێك خەڵکی ناکۆکیان تێدا هەبوو لە ئەسڵو فەرعی دونیادا دەبێت بیگێڕنەوە بۆلای قورئانو سوننەتی پێغەمبەر(ﷺ) وەك خودای گەورە لە ئایەتێکی تردا دەفەرموێت: ﴿وَمَا ٱخْتَلَفْتُمْ فِيهِ مِن شَىْءٍ فَحُكْمُهُۥٓ إِلَى ٱللَّهِ﴾[5] لەسەر هەرچی پێکنەهاتن، ئەوە بڕیارەکەی بۆلای خودا دەگەڕێتەوە. هەرشتێك قورئانو فەرموودەی پێغەمبەر(ﷺ) بڕیاریان لەسەرداو شایەتی ڕاستیان بۆدا ئەوە هەقە. دوای هەق جگە لە گومڕایی چیتر هەیە. بۆیە خودای گەورە دەفەرموێت: ﴿إِن كُنتُمْ تُؤْمِنُونَ بِٱللَّهِ وَٱلْيَوْمِ

[1] مسلم(١٨٣٨).

[2] فتح الباری(١٣/١١٩)، مسلم(٣/١٤٦٦).

[3] فتح الباری(١٣/١٣٠).

[4] الطبری(٨/٥٠٤).

[5] الشوری(١٠).

ﭐلۡأٓخِرِۚ﴾ ئەگەر بڕواتان بە خوداو بە ڕۆژی قیامەت هەیە. ئەم ئایەتە بەڵگەیە لەسەر ئەوە کە هەرکەسێك کێشەی هەبێت و چارەسەری کێشەکەی نەباتەوە بۆلای قورئان‌و فەرموودەکانی پێغەمبەر(ﷺ) ڕازی نەبێت بە فەرمانی خوداو پێغەمبەری خودا(ﷺ) لەسەر ئەو کێشەیە ئەوا ئەوکەسە بڕوای بە خوداو بە ڕۆژی قیامەت نیە. پاشان خودای گەورە دەفەرمووێت: ﴿ذَٰلِكَ خَيۡرٞ وَأَحۡسَنُ تَأۡوِيلًا﴾ ئەم کارە بۆتان باشترەو ئاکامی چاکتری هەیە. واتە: گەڕانەوە بۆ قورئان‌و فەرموودەکانی پێغەمبەر(ﷺ) زۆر چاکترەو ئاکامیشی زۆر باشترە وەك سوددی‌و کەسانی تریش وتویانە[1] موجاهد وتی: پاداشتەکەی زۆر چاکترە.[2] ئەم ڕایە نزیکترە.

﴿أَلَمۡ تَرَ إِلَى ٱلَّذِينَ يَزۡعُمُونَ أَنَّهُمۡ ءَامَنُواْ بِمَآ أُنزِلَ إِلَيۡكَ وَمَآ أُنزِلَ مِن قَبۡلِكَ يُرِيدُونَ أَن يَتَحَاكَمُوٓاْ إِلَى ٱلطَّٰغُوتِ وَقَدۡ أُمِرُوٓاْ أَن يَكۡفُرُواْ بِهِۦۖ وَيُرِيدُ ٱلشَّيۡطَٰنُ أَن يُضِلَّهُمۡ ضَلَٰلَۢا بَعِيدٗا ﴿٦٠﴾ وَإِذَا قِيلَ لَهُمۡ تَعَالَوۡاْ إِلَىٰ مَآ أَنزَلَ ٱللَّهُ وَإِلَى ٱلرَّسُولِ رَأَيۡتَ ٱلۡمُنَٰفِقِينَ يَصُدُّونَ عَنكَ صُدُودٗا ﴿٦١﴾ فَكَيۡفَ إِذَآ أَصَٰبَتۡهُم مُّصِيبَةُۢ بِمَا قَدَّمَتۡ أَيۡدِيهِمۡ ثُمَّ جَآءُوكَ يَحۡلِفُونَ بِٱللَّهِ إِنۡ أَرَدۡنَآ إِلَّآ إِحۡسَٰنٗا وَتَوۡفِيقًا ﴿٦٢﴾ أُوْلَٰٓئِكَ ٱلَّذِينَ يَعۡلَمُ ٱللَّهُ مَا فِي قُلُوبِهِمۡ فَأَعۡرِضۡ عَنۡهُمۡ وَعِظۡهُمۡ وَقُل لَّهُمۡ فِيٓ أَنفُسِهِمۡ قَوۡلَۢا بَلِيغٗا ﴿٦٣﴾﴾

**هەرکەسێك لەقورئان‌و سوننەت لابدات‌و کێشەکەی بۆلای هەر شتێکی تر ببات جگە لە قورئان‌و سوننەت ئەوە بە موسوڵمانان دانانرێت**

خودای مەزن دەفەرمووێت: ﴿أَلَمۡ تَرَ إِلَى ٱلَّذِينَ يَزۡعُمُونَ أَنَّهُمۡ ءَامَنُواْ بِمَآ أُنزِلَ إِلَيۡكَ وَمَآ أُنزِلَ مِن قَبۡلِكَ يُرِيدُونَ أَن يَتَحَاكَمُوٓاْ إِلَى ٱلطَّٰغُوتِ وَقَدۡ أُمِرُوٓاْ أَن يَكۡفُرُواْ بِهِۦۖ وَيُرِيدُ ٱلشَّيۡطَٰنُ أَن يُضِلَّهُمۡ ضَلَٰلَۢا بَعِيدٗا﴾ ئایا ئەوانەت نەدیوە، خۆیان وانیشانداوە، بەو قورئانەی بۆ تۆ هاتوەتە خوارەوەو بەو کتێبەش کە پێش لە تۆ ڕەوانە کراوە، بڕوا دەکەن. دەشیانەوێت کێشەیان بەرنە لای تاغووت، فەرمانیشیان پێدراوە: بڕوای پێ نەکەن، دیارە شەیتان وای دەوێت بەیەکجاری ڕێگەیان لێ هەڵە بکات. ئەم ناڕەزایی دەربڕینە لە لایەن خودای گەورەوە بەرانبەر ئەو کەسانە کە خۆیان وا نیشان دەدەن بڕوایان هەیە بەو کتێبەی خودا ناردویەتیە خوارەوە بۆ تۆو ئەو کتێبانەش کە ڕەوانەکراوە بۆ

---

[1] الطبری(٨/٥٠٦).

[2] الطبری(٨/٥٠٦).

پێغەمبەرە پێشوەکان. لەگەڵ ئەوەدا دەیانەوێت چارەسەری کێشەکانیان بەرنە لای کەسانی تر جگە لە کتێبی خوداو سوننەتی پێغەمبەرەکەی. وەك لە هۆی هاتنە خوارەوەی ئەم ئایەتەدا باسکراوە. کە ئەم ئایەتە لەسەر پیاوێکی ئەنساری‌و پیاوێکی جوولەکە هاتوەتە خوار کە کێشەیەکیان هەبوو، پیاوە جوولەکەکە دەیوت: با بچینە لای موحەممەد، پیاوە ئەنساریەکەش دەیوت: با بچینە لای کەعبی کوڕی ئەشرەف. وتراویشە: ئەم ئایەتە لەسەر کۆمەڵێك لە دووڕووەکان هاتوەتە خوار، ئەوانەی وایان نیشان دەدا کە موسڵمانن. ویستیان بۆ چارەسەری کێشەیەکیان بچنە لای کاربەدەستانی چەرخی نەفامی. جگە لەمە شتی تریش وتراوە. بەڵام ئەم ئایەتە گشتگیرترە لەمانە هەموو. خودای گەورە زەمی ئەو کەسانە دەکات کە لە قورئان‌و سوننەت لا دەدەن‌و کێشەکانیان دەبەنە لای ئەو کەسانە کە دادوەری بەمان ناکەن. بۆیە خودای گەورە دەفەرمووێت: ﴿يُرِيدُونَ أَن يَتَحَاكَمُوٓاْ إِلَى ٱلطَّٰغُوتِ﴾ دەشیانەوێت کێشەکەیان بەرنە لای تاغووت. پاشان خودای گەورە دەفەرمووێت: ﴿وَإِذَا قِيلَ لَهُمۡ تَعَالَوۡاْ إِلَىٰ مَآ أَنزَلَ ٱللَّهُ وَإِلَى ٱلرَّسُولِ رَأَيۡتَ ٱلۡمُنَٰفِقِينَ يَصُدُّونَ عَنكَ صُدُودٗا﴾ ئەگەر بێتو پێیان بڵێن: وەرنە لای ئەم قورئانە کە خودا ناردوویەتیە خوارەوە. وەرنە لای ئەم پێغەمبەرە، دووڕووەکان دەبینن کە زۆر بە توندی ڕوویان لە تۆ وەردەگێڕن. خۆبەزل زانیان ڕێیان پێنادا بێن. وەك خودای گەورە دەبارەی بت پەرستەکان دەفەرمووێت: ﴿وَإِذَا قِيلَ لَهُمُ ٱتَّبِعُواْ مَآ أَنزَلَ ٱللَّهُ قَالُواْ بَلۡ نَتَّبِعُ مَا وَجَدۡنَا عَلَيۡهِ ءَابَآءَنَآ﴾[1] ئەگەر بەوانە بوترێت: ئەوەی خودا ناردیە خوارەوە ئێوە پەیڕەوی لێبکەن دەڵێن: ئێمە هەر پەیڕەوی ئەو شتانەین کە باب‌و باپیرانمان لەسەری بوون. ئەمانە بەپێچەوانەی خاوەن باوەڕان کە خودای گەورە لە بارەیانەوە دەفەرمووێت: ﴿إِنَّمَا كَانَ قَوۡلَ ٱلۡمُؤۡمِنِينَ إِذَا دُعُوٓاْ إِلَى ٱللَّهِ وَرَسُولِهِۦ لِيَحۡكُمَ بَيۡنَهُمۡ أَن يَقُولُواْ سَمِعۡنَا وَأَطَعۡنَا﴾[2] بەڵام ئەوانەی خاوەن باوەڕن، هەرکاتێك بانگ دەکرێن، کە بێن بەرەو خوداو پێغەمبەرەکەی بۆ ئەوەی بڕیاریان بۆ بدات، خێرا دەڵێن: بیستمان‌و بەرفەرمانین.

### زەمی دوو ڕووەکان

پاشان خودای مەزن لە زەمی دووڕووەکاندا دەفەرمووێت: ﴿فَكَيۡفَ إِذَآ أَصَٰبَتۡهُم مُّصِيبَةُۢ بِمَا قَدَّمَتۡ أَيۡدِيهِمۡ﴾ ئایا چۆنە کە ئەوانە لەسەر کارێك خۆیان دەیکەن، هەرکاتێك تووشی بەڵایەك بوون. واتە ئایا حاڵیان چۆنە کاتێك بەهۆی ئەو تاوانانەوە کە دەیکەن بەڵایەك یەخەیان دەگرێت‌و چاریان

---

[1] لقمان(٢١).

[2] النور(٥١).

نامێنێت‌و دێنە لای تۆ کە چارەیەکیان بۆ دانێیت ﴿ثُمَّ جَآءُوكَ يَحۡلِفُونَ بِٱللَّهِ إِنۡ أَرَدۡنَآ إِلَّآ إِحۡسَٰنٗا وَتَوۡفِيقًا﴾ پاشان دێنە لات سوێند بەخودا دەخۆن کە: ئێمە بەنیازی چاکەکردن‌و نێوان خۆش کردن ئەو کارەمان کردوە. واتە: دێن پاکانەت بۆ دەکەن‌و سوێندت بۆ دەخۆن کە ئێمە چووین بۆلای ئەوانەو کێشەکانمان بردوە بۆ لایان تەنیا لەبەر لەیەك نزیك بونەوەو چاك کردنی نێوان بووە، بڕوامان وانەبووە کە ئەوان کێشەکانمان بۆ چارەسەر بکەن. وەك خودای گەورە باسی ئەو دوو ڕووانەی بۆ کردووین لە سورەتی مائیدەداو دەفەرموێت: ﴿فَتَرَى ٱلَّذِينَ فِي قُلُوبِهِم مَّرَضٞ يُسَٰرِعُونَ فِيهِمۡ يَقُولُونَ نَخۡشَىٰٓ أَن تُصِيبَنَا دَآئِرَةٞۚ فَعَسَى ٱللَّهُ أَن يَأۡتِيَ بِٱلۡفَتۡحِ أَوۡ أَمۡرٖ مِّنۡ عِندِهِۦ فَيُصۡبِحُواْ عَلَىٰ مَآ أَسَرُّواْ فِيٓ أَنفُسِهِمۡ نَٰدِمِينَ﴾[1] ئەو کەسانەی کە نەخۆشی لەدڵیاندایە، دەبینی بەپەلەن بۆ چوونەلایان، دەڵێن: ئێمە دەترسین تووشی بەلا بین(بۆیە دۆستایەتیان دەکەین) هیچ دوور نیە خودا ڕۆژێك سەریان بخات، یا خودا کارێکی تر بکات لەلایەن خۆیەوە. ئەوسا ئەوان لەوەی شاردویانەتەوەو لە دڵیاندایە، تووشی پەشیمانی دەبن. تەبەرانی ڕیوایەتی کردووە لە ئیبنو عەبباسەوە وتی: ئەبو بەرزەی ئەسلەمی فاڵچی(کاهن) بوو دادوەری لە نێوان جوولەکەکاندا دەکرد لەو شتانە کەکێشەیان تێدا دەبوو. هەندێك لە موسوڵمانانیش چوونە لای بۆ چارەسەرکردنی کێشەکانیان خودای گەورە ئەم ئایەتانەی نارده خوارەوە کە دەفەرموێت: ﴿أَلَمۡ تَرَ إِلَى ٱلَّذِينَ يَزۡعُمُونَ أَنَّهُمۡ ءَامَنُواْ بِمَآ أُنزِلَ إِلَيۡكَ وَمَآ أُنزِلَ مِن قَبۡلِكَ﴾ هەتا دەگاتە: ﴿إِنۡ أَرَدۡنَآ إِلَّآ إِحۡسَٰنٗا وَتَوۡفِيقًا﴾[2] پاشان خودای گەورە دەفەرموێت: ﴿أُوْلَٰٓئِكَ ٱلَّذِينَ يَعۡلَمُ ٱللَّهُ مَا فِي قُلُوبِهِمۡ﴾ ئەوانە خودا دەزانێت چیان لەدڵدایە. ئەم دووڕووانە کۆمەڵێك لەخەڵکن. خودا خۆی دەزانێت چی لە دڵیاندایە، بەو زووانە تۆڵەیان لێ دەسێنێت لەسەر ئەو ڕەفتارەیان، چونکە خودا خۆی هیچ شتێکی لاشاراوە نیە. ئەی موحوممەد(ﷺ) تۆ وازیان لێ بێنەو پشت گوێیان بخە، خودا ئاگاداری ئاشکراو پەنهانیانە. هەر بۆیە خودای گەورە دەفەرموێت: ﴿فَأَعۡرِضۡ عَنۡهُمۡ وَعِظۡهُمۡ﴾ تۆ هەر وازیان لێ بێنەو ئامۆژگاریان بکە. توندو تیژی بەکارمەهێنە دەربارەیان. ڕێگریان لێ بکە لەسەر ئەو دوو ڕوویی‌و شتە خراپانەی لەدڵیاندایە ﴿وَقُل لَّهُمۡ فِيٓ أَنفُسِهِمۡ قَوۡلَۢا بَلِيغٗا﴾ بەشێوەیەك لەگەڵیان بدوێ‌و دڵیان بۆلای خۆت ڕاکێشی.

---

[1] المائدة(٥٢).

[2] الطبراني(١١/٢٧٣).

﴿ وَمَآ أَرْسَلْنَا مِن رَّسُولٍ إِلَّا لِيُطَاعَ بِإِذْنِ ٱللَّهِ ۚ وَلَوْ أَنَّهُمْ إِذ ظَّلَمُوٓا۟ أَنفُسَهُمْ جَآءُوكَ فَٱسْتَغْفَرُوا۟ ٱللَّهَ وَٱسْتَغْفَرَ لَهُمُ ٱلرَّسُولُ لَوَجَدُوا۟ ٱللَّهَ تَوَّابًا رَّحِيمًا ﴿٦٤﴾ فَلَا وَرَبِّكَ لَا يُؤْمِنُونَ حَتَّىٰ يُحَكِّمُوكَ فِيمَا شَجَرَ بَيْنَهُمْ ثُمَّ لَا يَجِدُوا۟ فِىٓ أَنفُسِهِمْ حَرَجًا مِّمَّا قَضَيْتَ وَيُسَلِّمُوا۟ تَسْلِيمًا ﴿٦٥﴾ ﴾

**دەبێت گوێڕایەڵی پێغەمبەر(ﷺ) بکرێت**

خودای مەزن دەفەرموێت: ﴿ وَمَآ أَرْسَلْنَا مِن رَّسُولٍ إِلَّا لِيُطَاعَ بِإِذْنِ ٱللَّهِ ﴾ هیچ پێغەمبەرێکمان ڕەوانە نەکردووە مەگین بۆ ئەوە بووە گوێڕایەڵی بکرێت بەئیزنی خودا. واتە: گوێڕایەڵی فەرز بووە لەسەر ئەوانەی بۆیان ڕەوانەکراوە بەئیزنی خودا. موجاهد وتی: واتە: هیچ کەسێك گوێڕایەڵی ناکرێت مەگین بەئیزنی خودا[1] واتە: هیچ کەسێك گوێڕایەڵیان ناکات مەگین خودا یارمەتی بدات بۆ ئەوە. وەك خودای گەورە لە ئایەتێکی تردا دەفەرموێت: ﴿ وَلَقَدْ صَدَقَكُمُ ٱللَّهُ وَعْدَهُۥٓ إِذْ تَحُسُّونَهُم بِإِذْنِهِۦ ﴾[2] خودا بەڵێنی بەئێوە داو بەجێی هێنا، ئەوسا بەئیزنی خودا دەتان کوشتن. واتە: بەفەرمان و ئیزن و مەیلی خودا زاڵ دەبون بەسەریاندا. ﴿وَلَوْ أَنَّهُمْ إِذ ظَّلَمُوٓا۟ أَنفُسَهُمْ ﴾ جا ئەوانە لەپاش ئەوەی ئەو ناهەقیەیان لە خۆیان کرد. خودای گەورە ڕێنمایی ئەو یاخی و گوناهبارانە دەکات، کاتێك کە تووشی ئەو هەڵەو سەرپێچیە بوون ﴿جَآءُوكَ فَٱسْتَغْفَرُوا۟ ٱللَّهَ وَٱسْتَغْفَرَ لَهُمُ ٱلرَّسُولُ﴾ ئەگەر بهاتنایە بۆلای تۆو داوای لێبوردنیان بکردایە لەخوداو پێغەمبەریش داوای لێ خۆشبونی بۆ بکردنایە، خودای مەزن تەوبەکەی لێ قبوڵ دەکردن و بەزەیی پێیاندا دەهاتەوەو لێیان خۆش دەبوو. بۆیە خودای گەورە دەفەرموێت: ﴿لَوَجَدُوا۟ ٱللَّهَ تَوَّابًا رَّحِيمًا ﴾ بێگومان ئەوسا دەیانبینی کە خودا تەوبەیان قبووڵ دەکات و دڵۆڤانە.

**کەس نابێتە خاوەن باوەڕ هەتا هەر فەرمانێك پێغەمبەر بیدات لە کێشەکانیان لەدڵەوە پێی ڕازی نەبێت و ملی بۆ کەچ نەکات**

خودای مەزن دەفەرموێت: ﴿ فَلَا وَرَبِّكَ لَا يُؤْمِنُونَ حَتَّىٰ يُحَكِّمُوكَ فِيمَا شَجَرَ بَيْنَهُمْ ﴾ نەخێر سوێند بە پەروەردگاری تۆ ئەمانە نابنە خاوەن بڕوا مەگین وەختێك کەلە کێشەو هەرای نێوان خۆیاندا بتکەنە دادوەر. خودای مەزن بەگیانی پیرۆزی خۆی سوێند دەخوات کەهیچ کەسێك خاوەنی باوەڕ نیە

---

[1] الطبری(٨/٥١٦).

[2] ال عمران(١٥٢).

هەتا پێغەمبەر(ﷺ) لەهەر کاروبارێکیدا نەکاتە دادوەری خۆی. ئەویش پێغەمبەر(ﷺ) فەرمانی پێدەکات هەر ئەوە ڕاستەو دەبێت مل کەچی بۆ بکرێت بە ئاشکراو بە نهێنی. بۆیە خودای گەورە دەفەرموێت: ﴿ ثُمَّ لَا يَجِدُوا فِي أَنفُسِهِمْ حَرَجًا مِّمَّا قَضَيْتَ وَيُسَلِّمُوا تَسْلِيمًا ﴾ پاشان لە دڵەوە بەهەر بڕیارێك تۆ داوتە ڕازی نەبن‌و بەتەواوی ملی بۆ کەچ نەکەن. بەبێ هیچ خۆگری‌و سەرپێچی‌و دوو دڵیەك. بوخاری ڕیوایەتی کردووە لە عوروەوە وتی: پیاوێك کێشەیەکی هەبوو لەگەڵ زوبەیردا لەسەر ئاوی شیوێك(دۆڵێك) لە حەرە(الحرة) پێغەمبەر(ﷺ) فەرمووی:(زوبەیر ئاوەکەت بدێرەو پاشان بەرەڵای بکە بۆ هاوسێکەت) پیاوە ئەنساریەکە وتی: ئەی پێغەمبەری خودا(ﷺ) هەر لەبەر ئەوەیە پورزای خۆتە؟ پێغەمبەری خودا ڕەنگی گۆڕاو پاشان فەرمووی :(زوبەیر ئاوەکەت بدێرەو پاشان ئاوەکە بگرە تا جۆگەکان پڕ لەئاو دەبێت پاشان ئاوەکە بەرەڵا بکە بۆ هاوسێکەت) پێغەمبەر(ﷺ) مافی تەواوی ئاودێری دا بە زوبەیر، بەڵام پێشتر ڕایەکی نیشان زوبەیر دا کە بۆ زوبەیرو ئەنساریەکەش چاك بوو. جا کاتێك ئەنساریەکە دەستی لە مافی خۆی هەڵنەگرت، پێغەمبەریش مافی تەواوی ئاودێرانی دا بە زوبەیر. بە بڕیارێکی ڕوون‌و ئاشکرا. زوبەیر وتی وادەزانم ئەم ئایەتە لەسەر ئەوە هاتە خوارەوە کە خودای گەورە دەفەرموێت: ﴿ فَلَا وَرَبِّكَ لَا يُؤْمِنُونَ حَتَّىٰ يُحَكِّمُوكَ فِيمَا شَجَرَ بَيْنَهُمْ ﴾[1] ئەبو ئیسحاق ئیبراهیمی کوڕی عەبدوڕەحمانی کوڕی ئیبراهیم کوڕی دوحەیم(دُحم) لە تەفسیرەکەیدا لە ئیبنو زەمرەوە(ضمرة) وتی: دوو پیاو کێشەیەکیان هێنایە لای پێغەمبەر(ﷺ) بڕیاری دا بۆ خاوەن هەقەکە بەسەر ئەوەدا هەقی نەبوو. ئەوەی کە هەقی نەبوو بڕیارەکەی بەسەردا درا وتی: ڕازی نابم. هاوەڵەکەی پێی وت: بۆ چیت دەوێت؟ وتی: با بچین بۆلای ئەبو بەکر، چوونە لای، ئەوەی بڕیاری هەقەکەی بۆ درا وتی: ئەمە کێشەیەمان بردە لای پێغەمبەر(ﷺ) بڕیاری دا بۆمن، ئەبو بەکر وتی: هەر ئەوەیە کە پێغەمبەری خودا بڕیاری بۆ داون. هاوەڵەکەی هەر ڕازی نەبوو، وتی: دەچین بۆلای عومەری کوڕی خەتاب، چونە لای، ئەوەی کە بڕیارەکەی بۆ درابوو بە عومەری وت: ئەم کێشەیەمان بردە لای پێغەمبەر(ﷺ) بڕیاری دا بۆ من بەسەر ئەمەدا، ئەمیش ڕازی نەبوو. عومەریش پرسیاری لێکرد. وتی:(بەڵێ) واتە: عومەر چووە ژورەوەو هاتە دەرەوە شمشێرێکی بەدەستەوە بوو دای بەسەری ئەوەدا کە ڕازی نەبوو کوشتی خودای گەورە ئەم ئایەتەی ناردە خوارەوە ﴿ فَلَا وَرَبِّكَ لَا يُؤْمِنُونَ ﴾[2].

---

[1] فتح الباري(٨/١٠٣).

[2] الدر المنثور(٢/٣٢٢) فەرموودەیەکی فەرموودە مورسەلە.

﴿وَلَوْ أَنَّا كَتَبْنَا عَلَيْهِمْ أَنِ اقْتُلُوا أَنفُسَكُمْ أَوِ اخْرُجُوا مِن دِيَارِكُم مَّا فَعَلُوهُ إِلَّا قَلِيلٌ مِّنْهُمْ وَلَوْ أَنَّهُمْ فَعَلُوا مَا يُوعَظُونَ بِهِ لَكَانَ خَيْرًا لَّهُمْ وَأَشَدَّ تَثْبِيتًا ﴿٦٦﴾ وَإِذًا لَّآتَيْنَاهُم مِّن لَّدُنَّا أَجْرًا عَظِيمًا ﴿٦٧﴾ وَلَهَدَيْنَاهُمْ صِرَاطًا مُّسْتَقِيمًا ﴿٦٨﴾ وَمَن يُطِعِ اللَّهَ وَالرَّسُولَ فَأُولَٰئِكَ مَعَ الَّذِينَ أَنْعَمَ اللَّهُ عَلَيْهِم مِّنَ النَّبِيِّينَ وَالصِّدِّيقِينَ وَالشُّهَدَاءِ وَالصَّالِحِينَ وَحَسُنَ أُولَٰئِكَ رَفِيقًا ﴿٦٩﴾ ذَٰلِكَ الْفَضْلُ مِنَ اللَّهِ وَكَفَىٰ بِاللَّهِ عَلِيمًا ﴿٧٠﴾﴾

**زۆربەی خەڵكی ئەو فەرمانانەی بەسەریاندا دەدرێت دژایەتی دەكەن( بەجێی ناهێنن )**

خودای مەزن باسی زۆرینەی خەڵكی دەكات ئەگەر فەرمانیان پێی بكردایە بەو شتانەی كە قەدەغە كراون‌و خۆیان دەیكەن نەیان دەكرد، چونكە سروشتیان بدو خراپەو لەسەر سەرپێچی‌و لاساری ڕاهاتووە ئەمەش لە ئاگاداری خودای گەورەیە بەو شتانەی كە هەر نەبووە یان بووە، وە چۆن بووەو چۆن دەبێت، هەر بۆیە خودای گەورە دەفەرموێت: ﴿وَلَوْ أَنَّا كَتَبْنَا عَلَيْهِمْ أَنِ اقْتُلُوا أَنفُسَكُمْ أَوِ اخْرُجُوا مِن دِيَارِكُم مَّا فَعَلُوهُ إِلَّا قَلِيلٌ مِّنْهُمْ﴾ ئەگەر ئێمە بۆ ئەوانەمان بنوسیایە كە یەكتری بكوژن یان لەوڵاتی خۆتان دەربچن كەمیان نەبێت نەیان دەكرد. پاشان دەفەرموێت: ﴿وَلَوْ أَنَّهُمْ فَعَلُوا مَا يُوعَظُونَ بِهِ لَكَانَ خَيْرًا لَّهُمْ﴾ ئەگەر ئەوان بەڕاستی كاریان بەو ئامۆژگاریانە بكردایە كە دەكران، ئەوە چاكتر بوو بۆیان لە دژایەتی كردنی فەرمانەكانی خوداو تاوان‌و خراپەكاری. ﴿وَأَشَدَّ تَثْبِيتًا﴾ باوەڕیشیان بەخودا بتەوتر دەبوو. سوددی وتی: باوەڕیان بەخودا بتەوتر دەسەلماند. ﴿وَإِذًا لَّآتَيْنَاهُم مِّن لَّدُنَّا أَجْرًا عَظِيمًا ﴿٦٧﴾ وَلَهَدَيْنَاهُمْ صِرَاطًا مُّسْتَقِيمًا﴾ ئەوسا ئێمەش لەلایەن خۆمانەوە پاداشتێكی گەورەمان بەوان دەبەخشی، واشمان دەكرد كە لە ڕێگەی ڕاستی ئێمەش شارەزا بن. واتە: لە دونیاو لە قیامەتدا.

**كەسێك گوێڕایەڵی خوداو پێغەمبەرەكەی بكات ئەوە لەگەڵ ڕێز لێگیراواندایە لەلای خودا**

خودای مەزن دەفەرموێت: ﴿وَمَن يُطِعِ اللَّهَ وَالرَّسُولَ فَأُولَٰئِكَ مَعَ الَّذِينَ أَنْعَمَ اللَّهُ عَلَيْهِم مِّنَ النَّبِيِّينَ وَالصِّدِّيقِينَ وَالشُّهَدَاءِ وَالصَّالِحِينَ وَحَسُنَ أُولَٰئِكَ رَفِيقًا﴾ هەر كەسێك بەفەرمانی خوداو ئەم پێغەمبەرە بێت، دەبێتە هاوڕێی ئەوانەی خودا چاكەی لەگەڵ كردوون لە ڕێزی پێغەمبەران‌و خودا پەرستانی ڕاستی‌و شەهیدان‌و پیاو چاكەكانن، چ هاوڕێیانێكی چاكیشن ئەمانە. واتە: هەركەسێك كار بەوشتانە بكات كە خوداو پێغەمبەرەكەی فەرمانیان پێكردووەو واز لەو كارە خراپانە بێنن كە قەدەغەیان كردووە بێگومان خودا لە شوێنێكی پڕ لەڕێزدا دایدەنێت‌و دەیكاتە هاوەڵی پێغەمبەران‌و ئەوانەش كە پلەیان دوای پێغەمبەران دێت لە ڕاستگۆیان‌و شەهیدان دوای ئەمانیش زۆرینەی خاوەن

باوەڕان کە بریتین لە پیاو چاکان‌و ئەوانەی کە ئاشکراو پەنهانیان وەك یەك بووە. پاشان خودای گەورە وەسفیان دەکات‌و دەفەرموێت: ﴿ وَحَسُنَ أُوْلَٰٓئِكَ رَفِيقًا ﴾ ج هاوڕێیانێکی چاکن ئەمانە.

بوخاری ڕیوایەتی کردووە لە عائیشەوە وتی: بیستم لە پێغەمبەری خودا(ﷺ) دەیفەرموو:(هیچ پێغەمبەرێك نەبووە کە نەخۆش کەوتبێت مەگین خودا سەرپشکی کردووە لە نێوان دونیاو قیامەتدا) پێغەمبەری خودا لەو نەخۆشیەی کە کۆچی دوایی پێدا کرد دەنگی زۆر گۆڕابوو، گوێم لێی بوو دەیفەرموو: (مع الذين أنعم الله عليهم من النبيين والصديقين والشُهداء والصلحين) زانیم کە سەرپشك کراوە[1] موسلیمش هەروا ڕیوایەتی کردووە[2] وە لەم فەرموودەیەدا فەرموویەتی:(ئەی خودایە لەگەڵ ئەو هاوەڵە پلە بڵندانەدا دەبم)[3] سێ جار ئەمەی فەرموو پاشان کۆچی دوایی کرد پێغەمبەری خودا(ﷺ).

**باسی هاتنە خوارەوەی ئەم ئایەتە پیرۆزە**

ئیبنو جەریر ڕیوایەتی کردووە لە سەعیدی کوڕی جوبەیرەوە، وتی: پیاوێکی ئەنساری هات بۆلای پێغەمبەری خودا(ﷺ) پێی وت:(ئەی فلان چیتە دەتبینم خەفەتباری؟) وتی: ئەی پێغەمبەری خودا(ﷺ) شتێکە بیرم لێکردوەتەوە، وتی: کامەیە؟ وتی: ئێمە بەیانی‌و ئێوارە دێینە خزمەتت، سەیری نێو چاوانت دەکەین‌و لە خزمەتتدا دادەنیشین، بەیانی واتە: ماوەیەکی تر تۆ پلەت بەرز دەبێتەوەو لەگەڵ پێغەمبەرانی، ئێمە ناگەین بەتۆ، پێغەمبەری خودا(ﷺ) هیچ وەلامێکی نەدایەوە. جوبرائیل ئەم ئایەتەی بۆ هێنایە خوارەوە ﴿وَمَن يُطِعِ ٱللَّهَ وَٱلرَّسُولَ فَأُوْلَٰٓئِكَ مَعَ ٱلَّذِينَ أَنْعَمَ عَلَيْهِم مِّنَ ٱلنَّبِيِّـۧنَ ﴾پێغەمبەر(ﷺ) ناردی بەشوێنیداو مزدەی پێدا.[4] ئەم فەرموودەیە بەمورسەلی(مرسل) ڕیوایەت کراوە لە مەسروق‌و عیکرمەو غامیری شەعبی‌و قەتادەوە. وە لە ڕەبیعی کوڕی ئەنەسەوە کە باشترین سەنەدیانە. وە بە مەرفوعی بەشێوەیەکی تر. ئەبو بەکری کوڕی مەردەویهی(مردەیە) لە عائیشەوە(ڕەزای خودای لێ بێت) وتی: پیاوێك هات بۆ خزمەت پێغەمبەر(ﷺ) وتی: ئەی پێغەمبەری خودا(ﷺ) تۆ خۆشەویستتری لەلای من لە گیانی خۆم، خۆشەویستتری لە ماڵ‌و منداڵم، خۆشەویستتری لە کوڕەکەم، هەندێك جار لەماڵی خۆمدا بیرت دەکەم‌و ئارام ناگرم دێم سەیرت دەکەم‌و کاتێکیش بیر لە مردنی خۆم‌و تۆ دەکەمەوە دەزانم کەتۆ چویتە بەهەشت پلەو جێگەت بەرزەکرێتەوە لەگەڵ پێغەمبەراندا، منیش ئەگەر بچمە بەهەشت دەترسم نەتبینم، پێغەمبەر(ﷺ) هیچ وەڵامی

---

[1] فتح الباري(٨/١٠٣).

[2] مسلم(٤/١٨٩٣).

[3] مسلم(٤/١٨٩٤).

[4] الطبري(٨/٥٣٤).

نەدایەوە هەتا ئەم ئایەتە هاتە خوارەوە بۆی: ﴿وَمَن يُطِعِ ٱللَّهَ وَٱلرَّسُولَ فَأُوْلَٰٓئِكَ مَعَ ٱلَّذِينَ أَنۡعَمَ ٱللَّهُ عَلَيۡهِم مِّنَ ٱلنَّبِيِّـۧنَ وَٱلصِّدِّيقِينَ وَٱلشُّهَدَآءِ وَٱلصَّٰلِحِينَۚ وَحَسُنَ أُوْلَٰٓئِكَ رَفِيقٗا ﴾ ئەبو عەبدوللای مەقدیسیش(المقدس) هەروا ڕیوایەتی کردووە لە کتێبەکەیدا(صفة الجنة) پاشان وتی: هیچ خراپییەك لە سەنەدەکەیدا نابینم[1] والله أعلم. وە لە سەحیحی موسلیمدا هاتووە لە ڕەبیعەی کوڕی کەعبی ئەسلەمیەوە کە وتی: من لەلای پێغەمبەر(ﷺ) دەمامەوە ئاوی دەست نوێژو پێویستیەکانم بۆ دەهێنا. پێی وتم:(داوا بکە)، وتم: ئەی پێغەمبەری خودا(ﷺ) داوام وایە کە لە بەهەشتدا لەگەڵت بم، فەرمووی:(جگە لەوە شتێکی ترت نیە؟)، وتم: هەرئەوە، فەرمووی: (هاوکاریم بکە بە(ڕاهێنان و ماندوکردنی) خۆت بە نوێژکردنی زۆر(بكثرة السجود)).[2] ئیمامی ئەحمەد ڕیوایەتی کردووە لە عەمری کوڕی مورەی جوهەنیەوە(مرة الجهنی) وتی: پیاوێك هات بۆلای پێغەمبەر(ﷺ) وتی: ئەی پێغەمبەری خودا(ﷺ) شایەتیم داوە کە هیچ پەرستراوێك نیە جگە لە خوداو تۆش پێغەمبەری خودای و پێنج نوێژەکەم کردووەو زەکاتی ماڵی خۆم داوەو ڕۆژوی مانگی ڕەمەزانم گرتووە. پێغەمبەری خودا(ﷺ) فەرمووی:(هەرکەسێك لەسەرئەوە مردبێت، ئەوە لەگەڵ پێغەمبەران و ڕاستگۆیان و شەهیدانە لە ڕۆژی قیامەتدا ئا بەوشێوەیە (هەردوو پەنجەی ڕاست کردەوە) بەومەرجەی ئازاری دایك و باوکی نەدابێت)[3] ئیمامی ئەحمەد خۆی ئەم فەرموودەی هێناوە. لەمانە لە هەموو گرنگترو گەورەتر ئەو موژدەیەیە کە لە فەرموودە سەحیح و موسنەدەکاندا هاتووە بەڕێگەی تەواتور لە کۆمەڵێك لە هاوەڵەکانی پێغەمبەری خوداوە(ﷺ) کە پێغەمبەری خودا(ﷺ) پرسیاری لێکرا لەبارەی ئەو پیاوەوە کە کۆمەڵێکی خۆشدەوێت بەڵام پێیان نەگەیشتووە،(بە کرداری چاك و عیبادەتی زۆر) فەرمووی: (هەرکەسە لەگەڵ ئەو کەسەدایە کە خۆشیویستووە) ئەنەس وتی: موسڵمانان زۆر دڵخۆشبوون بەم فەرموودەیەی پێغەمبەر(ﷺ)، وە لە ڕیوایەتێکی تردا هەر لە ئەنەسەوە وتی: من پێغەمبەری خودام(ﷺ) خۆشدەوێت، وە ئەبوبەکرو عومەرم خۆشدەوێت(ڕەزای خودایان لێ بێت) هیوام وایە کە خودا لەگەڵ ئەوان زیندووم بکاتەوە، هەرچەندە وەك کرداری ئەوان کردارم نەکردووە[4] پاشان خودای مەزن دەفەرموێت: ﴿ ذَٰلِكَ ٱلۡفَضۡلُ مِنَ ٱللَّهِۚ ﴾ ئەم چاکەیەش خودا دەربارەیان دەکات. واتە: ئەم بەزەییەش لەلایەن خوداوەیە، هەر خودا خۆیەتی هەڵیبژاردوون و شایستەی کردوون، نەك

[1] الطبراني(٣٣٠٨)، ومن طريق أبي نعيم في الحلية(١٢٥/٨) سەنەدەکەی خراپ نیە.

[2] مسلم(٤٨٩).

[3] جامع المسانيد والسنن(٧٧/١٠) سەنەدەکەی حەسەنە.

[4] فتح الباري(٥١/٧).

بەکردەوەکانیان. ﴿وَكَفَىٰ بِٱللَّهِ عَلِيمًا﴾ خودایان بەسە کە بەکردەوەیان دەزانێت. واتە: خودا خۆی دەزانێت کێ شایستەی یارمەتی‌و ڕێنیشاندانە.

﴿ يَـٰٓأَيُّهَا ٱلَّذِينَ ءَامَنُوا۟ خُذُوا۟ حِذْرَكُمْ فَٱنفِرُوا۟ ثُبَاتٍ أَوِ ٱنفِرُوا۟ جَمِيعًا ﴿٧١﴾ وَإِنَّ مِنكُمْ لَمَن لَّيُبَطِّئَنَّ فَإِنْ أَصَـٰبَتْكُم مُّصِيبَةٌ قَالَ قَدْ أَنْعَمَ ٱللَّهُ عَلَىَّ إِذْ لَمْ أَكُن مَّعَهُمْ شَهِيدًا ﴿٧٢﴾ وَلَئِنْ أَصَـٰبَكُمْ فَضْلٌ مِّنَ ٱللَّهِ لَيَقُولَنَّ كَأَن لَّمْ تَكُنۢ بَيْنَكُمْ وَبَيْنَهُۥ مَوَدَّةٌ يَـٰلَيْتَنِى كُنتُ مَعَهُمْ فَأَفُوزَ فَوْزًا عَظِيمًا ﴿٧٣﴾ ۞ فَلْيُقَـٰتِلْ فِى سَبِيلِ ٱللَّهِ ٱلَّذِينَ يَشْرُونَ ٱلْحَيَوٰةَ ٱلدُّنْيَا بِٱلْـَٔاخِرَةِ ۚ وَمَن يُقَـٰتِلْ فِى سَبِيلِ ٱللَّهِ فَيُقْتَلْ أَوْ يَغْلِبْ فَسَوْفَ نُؤْتِيهِ أَجْرًا عَظِيمًا ﴿٧٤﴾ ﴾

### فەرماندان بە خۆپارێزی‌و هۆشیاری بەرامبەر دوژمن

خودای مەزن دەفەرموێت: ﴿ يَـٰٓأَيُّهَا ٱلَّذِينَ ءَامَنُوا۟ خُذُوا۟ حِذْرَكُمْ فَٱنفِرُوا۟ ثُبَاتٍ أَوِ ٱنفِرُوا۟ جَمِيعًا ﴾ ئەی کۆمەڵی خاوەن باوەڕان هەمیشە هۆشتان بەخۆتانەوەبێت‌و ئامادەبن. دەستە دەستە، یان پێکەوە بەتێکڕایی بچنە غەزا. خودای گەورە فەرمان بە بەندە خاوەن باوەڕەکانی دەکات هەمیشە ئاگایان لە دوژمنەکانیان بێت. ئەمەش پێویست بەوە دەکات کە بەردەوام خەریکی خۆئامادەکردن بن لەبارەی هێزی دەروونی‌و کەرەسەی جەنگی‌و ژمارەی زۆری سەربازیەوە بۆ غەزاکردن لە ڕێگەی خودادا(ثُبَاتٍ) واتە: کۆمەڵ دوای کۆمەڵ‌و دەستە دوای دەستەو سریە دوای سریە عەلی کوڕی ئەبوتەلحە لە ئیبنو عەباسەوە لەم دەقەدا کە خودای گەورە دەفەرموێت وتی: ﴿فَٱنفِرُوا۟ ثُبَاتٍ﴾ واتە: دەستەی جیاجیا ﴿أَوِ ٱنفِرُوا۟ جَمِيعًا﴾ یان هەمووتان پێکەوە[1] هەر بەم شێوەیە ڕیوایەت کراوە لە موجاهدو عیکرمەو سوددی‌و قەتادەو زەحاکو عەتای خوراسانی‌و خوسەیفی جەزەری(خصيف الجزري) موقاتیلی کوڕی حەییانەوە[2].

### یەکێك لە نیشانەکانی دووڕووەکان دواکەوتنە لە غەزا

خودای مەزن دەفەرموێت: ﴿وَإِنَّ مِنكُمْ لَمَن لَّيُبَطِّئَنَّ﴾ هەندێکی واتان لەناودایە بە ئارەزو خۆیان دوادەخەن‌و پێتان ناگەن. موجاهیدو کەسانی تریش وتویانە: ئەم ئایەتە لەسەر دووڕووەکان هاتووەتەخوارەوە[3] موقاتیلی کوڕی حەییان وتی: ﴿لَّيُبَطِّئَنَّ﴾ واتە: هەندێك خۆیان لە غەزا دوادەخەن.

---

[1] الطبري(٨/٥٣٧).

[2] الطبري(٨/٥٣٧/٥٣٨).

[3] الطبري(٨/٥٣٨).

هەڵدەگرێت مەبەست پێی کەسێك بێت کە خۆی دەگرێتەدواو ناچێت بۆ غەزاو خەڵکیش والێدەکات کە نەچن بۆ غەزا، وەك عەبدولاّی کوڕی ئوبەی کوڕی سەلول وای دەکرد(خودا ڕووی ڕەش بکات) خۆی نەدەچوو بۆ غەزاو خەڵکیشی هاندەدا کە دەرنەچن بۆ غەزا، ئەمە قسەی ئیبنو جورەیجو ئیبنو جەریرە. هە بۆیە خودای مەزن باسی دووڕووەکان دەکات کاتێك کە دوادەکەوێت لە غەزاو ناڕوات دەفەرموێت: ﴿فَإِنْ أَصَٰبَتْكُم مُّصِيبَةٌ قَالَ قَدْ أَنْعَمَ ٱللَّهُ عَلَىَّ إِذْ لَمْ أَكُن مَّعَهُمْ شَهِيدًا ﴾ ئەگەر تووشی بەلاو نوشتیەك هاتن دەڵێن: خودا چاکەی لەگەڵ من کردووە کە لەگەڵیاندا نەبووم. واتە ئەگەر هەندێکتان شەهیدبوون یان دوژمن سەرکەوتنێکی بەدەستهێنا بەسەریاندا(خودا خۆی ئاگادارەو هیچ کارێکی بێ حیکمەت نیە) دەڵێت:باشبوو ئامادەی ئەو شەڕە نەبووم، خودا چاکەی لەگەڵم کردووە. نازانێت کە بێ بەش بووە لەو پاداشتی خۆڕاگرییەدا بەرامبەر دوژمن یان ئەگەر بکوژرایە شەهید دەبوو. ﴿ وَلَئِنْ أَصَٰبَكُمْ فَضْلٌ مِّنَ ٱللَّهِ لَيَقُولَنَّ كَأَن لَّمْ تَكُنۢ بَيْنَكُمْ وَبَيْنَهُۥ مَوَدَّةٌ يَٰلَيْتَنِى كُنتُ مَعَهُمْ فَأَفُوزَ فَوْزًا عَظِيمًا ﴾ ئەگەر ئێوە لەسایەی چاکەی خوداوە، دەستکەوتێك پاداشتان دەستکەوت، وەك کەسێك کە لە پێشدا یەکترتان نەناسیبێتو دۆستایەتیتان نەبووبێت، دەڵێت: خۆزگە منیش لەگەڵیان بوومایە. ئەوسا منیش لەو خێروبێرە گەورەیە بەژداردەبووم. واتە: هەموو هیواو مەبەستێکی هەر ئەوەبوو پشکێکی لەو دەستکەوتە لەگەڵ ئەوان ببوایە.

**هاندان بۆ غەزاکردن**

پاشان خودای مەزن دەفەرموێت: ﴿فَلْيُقَٰتِلْ فِى سَبِيلِ ٱللَّهِ ٱلَّذِينَ يَشْرُونَ ٱلْحَيَوٰةَ ٱلدُّنْيَا بِٱلْءَاخِرَةِ ﴾ با ئەوانەی دەست لە دونیا هەڵدەگرن بۆ ڕۆژی دوایی، بچنە غەزا لە ڕێگەی خودا پاشان دەفەرموێت:﴿وَمَن يُقَٰتِلْ فِى سَبِيلِ ٱللَّهِ فَيُقْتَلْ أَوْ يَغْلِبْ فَسَوْفَ نُؤْتِيهِ أَجْرًا عَظِيمًا﴾ ئەوەی کە دەچێتە غەزا لە ڕێی خودادا، چ بکوژرێتو چ سەربکوێت لە دونیاو لە دواییدا پاداشتی گەورەی دەدەینێ. وەك لە هەردوو سەحیحەکەدا هاتووە:(خودا دەستەبەری کردووە بۆ ئەوکەسەی غەزا دەکات لە ڕێگەی ئەودا، ئەگەر مراندی بیخاتە بەهەشت، یان بیگێڕێتەوە بۆ ئەو ماڵەی لێی دەرچووە لەگەڵ ئەوەی بەدەستی هێناوە لە پاداشتو دەسکەوتی جەنگ)[1].

﴿وَمَا لَكُمْ لَا تُقَٰتِلُونَ فِى سَبِيلِ ٱللَّهِ وَٱلْمُسْتَضْعَفِينَ مِنَ ٱلرِّجَالِ وَٱلنِّسَآءِ وَٱلْوِلْدَٰنِ ٱلَّذِينَ يَقُولُونَ رَبَّنَآ أَخْرِجْنَا مِنْ هَٰذِهِ ٱلْقَرْيَةِ ٱلظَّالِمِ أَهْلُهَا وَٱجْعَل لَّنَا مِن لَّدُنكَ وَلِيًّا وَٱجْعَل لَّنَا مِن لَّدُنكَ نَصِيرًا ﴿٧٥﴾ ٱلَّذِينَ ءَامَنُوا۟ يُقَٰتِلُونَ فِى

[1] فتح الباری(٦/٢٥٣)، مسلم(٣/١٤٩٦).

سَبِيلِ ٱللَّهِ ۖ وَٱلَّذِينَ كَفَرُوا۟ يُقَٰتِلُونَ فِى سَبِيلِ ٱلطَّٰغُوتِ فَقَٰتِلُوٓا۟ أَوْلِيَآءَ ٱلشَّيْطَٰنِ ۖ إِنَّ كَيْدَ ٱلشَّيْطَٰنِ كَانَ ضَعِيفًا ﴿٧٦﴾ ﴾

**هاندان لەسەر غەزاكردن بۆ ڕزگاركردنی لاوازو بێ دەستەڵاتەكان**

خـوداى مـەزن دەفـەرمووێت: ﴿وَمَا لَكُمْ لَا تُقَٰتِلُونَ فِى سَبِيلِ ٱللَّهِ وَٱلْمُسْتَضْعَفِينَ مِنَ ٱلرِّجَالِ وَٱلنِّسَآءِ وَٱلْوِلْدَٰنِ﴾ بۆچی ئێوە ناچن بۆ غەزا لە ڕێگای خوداو لەبەر چەوساوەكان؟ لەبەر ئەو پیاوان و ژنان و منداڵانە. خودای گەورە لێرەدا هانی بەندە خاوەن باوەڕكانی دەدات لەسەر غەزاكردن لە ڕێی خوداداو هەوڵدان بۆ ڕزگاركردنی ئەو چەوساوانەی كە لەناو مەككەدان لە پیاوان و ژنان و منداڵان كە گیریان كردووەو هیچ دەستەڵاتێكیان نیە هەربۆیە دەفەرمووێت: ﴿ٱلَّذِينَ يَقُولُونَ رَبَّنَآ أَخْرِجْنَا مِنْ هَٰذِهِ ٱلْقَرْيَةِ﴾ كە دەڵێن: ئەی پەروەردگارمان، لەم شارەمان ڕزگارمان بكە. ئەم ئایەتە وەك ئەو ئایەتە وایە كەخودای گەورە دەفەرمووێت: ﴿ وَكَأَيِّن مِّن قَرْيَةٍ هِىَ أَشَدُّ قُوَّةً مِّن قَرْيَتِكَ ٱلَّتِىٓ أَخْرَجَتْكَ ﴾[1] زۆر شاری واهەبووە ە خەڵكی شارەكەی تۆ(ئەوەی تۆیان لێ دەركرد) زۆر بەهێزو گورتر بوو. پاشان وەسفی ستەمكاری خەڵكەكەی دەكات و دەفەرمووێت: ﴿ٱلظَّالِمِ أَهْلُهَا وَٱجْعَل لَّنَا مِن لَّدُنكَ وَلِيًّا وَٱجْعَل لَّنَا مِن لَّدُنكَ نَصِيرًا﴾ وا خەڵكەكەی ستەمكارن، ڕزگارمان بكەو لەلای خۆتەوە یارو یاوەرێكمان بۆ دیاری بكە. واتە: كەسانێكمان بۆ بنێرە یارەتیمان بدەن و ڕزگارمان بكەن لەدەستی ئەم ستەمكارانە. بوخاری ڕیوایەتی كردووە لە ئیبنو عەباسەوە وتی: من و دایكم یەكێك بووین لەو چەوساوانە[2] پاشان خودای گەورە دەفەرمووێت: ﴿ٱلَّذِينَ ءَامَنُوا۟ يُقَٰتِلُونَ فِى سَبِيلِ ٱللَّهِ ۖ وَٱلَّذِينَ كَفَرُوا۟ يُقَٰتِلُونَ فِى سَبِيلِ ٱلطَّٰغُوتِ﴾ ئەوانەی خاوەن باوەڕن غەزادەكەن لە ڕێی خودا، ئەوانەش خودانەناسن لە ڕێگەی تاغووت شەڕدەكەن. واتە: خاوەن باوەڕان غەزا دەكەن لەبەر ڕەزامەندیو گوێڕایەڵی فەرمانی خودا، خودانەناسانیش شەڕدەكەن لە ڕێگەی شەیتاندا. پاشان خودای مەزن خاوەن باوەڕان هاندەدات و هەڵیاندەنێت كە شەڕ لەگەڵ دوژمنانی خودا بكەن و دەفەرمووێت: ﴿فَقَٰتِلُوٓا۟ أَوْلِيَآءَ ٱلشَّيْطَٰنِ ۖ إِنَّ كَيْدَ ٱلشَّيْطَٰنِ كَانَ ضَعِيفًا﴾ دەسا ئێوە بچنە شەڕی ئەوانەی دۆستی شەیتانن، فێڵی شەیتان بێ هێزو پێزو زەبوونە.

﴿أَلَمْ تَرَ إِلَى ٱلَّذِينَ قِيلَ لَهُمْ كُفُّوٓا۟ أَيْدِيَكُمْ وَأَقِيمُوا۟ ٱلصَّلَوٰةَ وَءَاتُوا۟ ٱلزَّكَوٰةَ فَلَمَّا كُتِبَ عَلَيْهِمُ ٱلْقِتَالُ إِذَا فَرِيقٌ مِّنْهُمْ يَخْشَوْنَ ٱلنَّاسَ كَخَشْيَةِ ٱللَّهِ أَوْ أَشَدَّ خَشْيَةً ۚ وَقَالُوا۟ رَبَّنَا لِمَ كَتَبْتَ عَلَيْنَا ٱلْقِتَالَ لَوْلَآ أَخَّرْتَنَآ إِلَىٰٓ أَجَلٍ قَرِيبٍ ۗ قُلْ مَتَٰعُ ٱلدُّنْيَا

---

[1] محمد(١٣).

[2] فتح الباری(١٠٣/٨).

قَلِيلٌ وَالْآخِرَةُ خَيْرٌ لِّمَنِ اتَّقَىٰ وَلَا تُظْلَمُونَ فَتِيلًا ﴿٧٧﴾ أَيْنَمَا تَكُونُوا يُدْرِككُّمُ الْمَوْتُ وَلَوْ كُنتُمْ فِي بُرُوجٍ مُّشَيَّدَةٍ ۗ وَإِن تُصِبْهُمْ حَسَنَةٌ يَقُولُوا هَٰذِهِ مِنْ عِندِ اللَّهِ ۖ وَإِن تُصِبْهُمْ سَيِّئَةٌ يَقُولُوا هَٰذِهِ مِنْ عِندِكَ ۚ قُلْ كُلٌّ مِّنْ عِندِ اللَّهِ ۖ فَمَالِ هَٰؤُلَاءِ الْقَوْمِ لَا يَكَادُونَ يَفْقَهُونَ حَدِيثًا ﴿٧٨﴾ مَّا أَصَابَكَ مِنْ حَسَنَةٍ فَمِنَ اللَّهِ ۖ وَمَا أَصَابَكَ مِن سَيِّئَةٍ فَمِن نَّفْسِكَ ۚ وَأَرْسَلْنَاكَ لِلنَّاسِ رَسُولًا ۚ وَكَفَىٰ بِاللَّهِ شَهِيدًا ﴿٧٩﴾ ﴾

**سەرزەنشتکردنی ئەوانەی کە لە پێشدا داوای شەڕکردنیان دەکرد کە فەرزبووە حەز لـە دواخـستنی دەکەن**

خودای مەزن دەفەرموێت: ﴿ أَلَمْ تَرَ إِلَى الَّذِينَ قِيلَ لَهُمْ كُفُّوا أَيْدِيَكُمْ وَأَقِيمُوا الصَّلَاةَ وَآتُوا الزَّكَاةَ فَلَمَّا كُتِبَ عَلَيْهِمُ الْقِتَالُ إِذَا فَرِيقٌ مِّنْهُمْ يَخْشَوْنَ النَّاسَ كَخَشْيَةِ اللَّهِ أَوْ أَشَدَّ خَشْيَةً ﴾ ئایا ئەوانەت نەدیوە، پێیان وترا: هەتا لە مەککەن شەڕمەکەن نوێژیکەن‌و زەکات بدەن، کاتێك بیستیان غەزایان لەسەر نوسراوە، زانیان دەبێت بچن بۆ شەڕ، ئەوەندە ترسیان لێ نیشت لەو خەڵکە کە دەچوون بەگژیانیاندا، کە لـە خوداش هەرئەوندە دەترسان‌و بگرە زیاتریش دەترسان. موسڵمانەکان لـە سەرەتای هاتنی ئیسلامدا کە لـە مەککە بوون فەرمانیان پێکرابوو نوێژ بکەن‌و زەکات بدەن، هەرچەندە ماڵ‌و سامنێکی زۆریشیان نەبوو، بەلام فەرمانیان پێکرابوو کە هاوکاری هەژارەکانی خۆیان بکەن‌و لێبوردەبن و چاوپۆشی لە بت پەرستەکان بکەن‌و خۆڕاگرین تا ماوەیەکی تر. بۆیە هەر خۆیان دەخواردەوەو حەزیان دەکرد فـەرمانی غەزا دەربکرێت‌و هەقی خۆیان لە دوژمنەکانیان بسێنن. بەڵام لەودەمەدا شەڕکردن گونجاو نەبوو لەبەر چەند هۆکارێك لەوانە: کەمی ژمارەی موسڵمانان‌و زۆری ژما رەی دوژمنـەکانیان. وە ئـەوان لـە زێدی خۆیاندابوون کە وڵاتی حەرام بوو پیرۆزترین پارچە زەوی بوو لەسەر زەمیندا، نەدەبوو پێش دەستی بکرێت لە شەڕکردن تێیدا نەشیاوبوو. لەبەرئەو فەرمانی غەزا دەرنەکرا هەتا چوونە مەدینە. کاتێك کە چوونە مەدینەو دەستەڵاتیان پەیداکردو یارمەتیدەریان بۆ پەیدابوو، فـەرمانیان پێکرا بـەوەی کە لـە پێشدا ئاواتەخوازی بوون، هەندێکیان ترس دایگرتن‌و لە ڕوبەڕوبوونەوەی دوژمن دەترسان چ ترسێك! ترســـێکی زۆر ﴿ وَقَالُوا رَبَّنَا لِمَ كَتَبْتَ عَلَيْنَا الْقِتَالَ لَوْلَا أَخَّرْتَنَا إِلَىٰ أَجَلٍ قَرِيبٍ ﴾ دەیـــانوت: ئـــەی پەروەردگارمان بۆچی غەزات بۆنوسیوین، چی دەبوو تا ماوەیەکی تـر دوات خستایە؟ چونکە خوێنی تێدا دەڕژێت‌و منداڵان تێیدا بێ باوك دەبن‌و ژنان بێوەژن دەکەون، ئەم ئایەتە وەك ئەو ئایەتە وایە کە خودای گەورە دەفەرموێت: ﴿ وَيَقُولُ الَّذِينَ آمَنُوا لَوْلَا نُزِّلَتْ سُورَةٌ ۖ فَإِذَا أُنزِلَتْ سُورَةٌ مُّحْكَمَةٌ وَذُكِرَ فِيهَا

ٱلْقِتَالُ ﴾[1] ئەوانەی خاوەن باوەڕن دەڵێن: بۆچی سورەتێك نایەتەخوارەوە؟ کاتێك کە سورەتێکی پتەو هات و باسی غەزای کرد تا کۆتایی ئایەتەکە. ئیبنو ئەبی حاتەم ڕیوایەتی کردووە لە ئیبنو عەباسەوە وتی: عەبدوڕەحمانی کوڕی عەوف و هەندێك لە هاوەڵەکانی خاتن بۆلای پێغەمبەر(ﷺ) لە مەککەو وتیان: ئەی پێغەمبەری خودا(ﷺ) ئێمە کە بت پەرستبووین خاوەنی دەسەڵات بووین، کاتێك کە بووینە خاوەن باوەڕ زەلیل بووین. پێغەمبەر(ﷺ) فەرمووی:(من فرمانم پێدراوە کە لێبوردەبم نەچم بەگژ هۆزەکەتاندا)کاتێك کە خودا بردیە مەدینە فەرمانی پێکرد کە غەزا بکات. کەچی ئەوان غەزایان نەکرد. خودای گەورە ئەم ئایەتەی ناردەخوارەوەك ﴿ أَلَمْ تَرَ إِلَى ٱلَّذِينَ قِيلَ لَهُمْ كُفُّوٓا۟ أَيْدِيَكُمْ ﴾[2] نەسائی و حکمیش ڕیوایەتیان کردووە.[3] خودای مەزن دەفەرمووێت: ﴿ قُلْ مَتَٰعُ ٱلدُّنْيَا قَلِيلٌ وَٱلْءَاخِرَةُ خَيْرٌ لِّمَنِ ٱتَّقَىٰ ﴾ بڵێ: ژیانی دونیا کەم و کورتەو بۆ ئەوانەی کە ترسیان لە خودا هەیە، ژیانی ئەولا(قیامەت) زۆر باشترە. ﴿ وَلَا تُظْلَمُونَ فَتِيلًا ﴾ بە ئەندازەی تاڵی ناو دەنکە خورمایەك کەس ناهەقی لێ ناکرێت، بەلکو پاداشتی ئەو کردارەیان وەردەگرن بە باشترین پاداشت. ئەمە دڵخۆشدانەوەیەکی خاوەن باوەڕانە لە دونیاو هاندانیانە بۆ خۆبەخت کردن لە ڕێگەی خوداو بۆنەوەی ئەو پاداشتە مەزنەی ڕۆژی قیامەت وەربگرن.

### ڕاکردن لە مردن نیە

خودای مەزن دەفەرمووێت: ﴿ أَيْنَمَا تَكُونُوا۟ يُدْرِككُّمُ ٱلْمَوْتُ وَلَوْ كُنتُمْ فِى بُرُوجٍ مُّشَيَّدَةٍ ﴾ لە هەر کوێیەك بن تەنانەت ئەگەر لە قەڵای زۆر قایمیش(خۆتان بشرنەوە) مردن پێتان دەگات. واتە: ئێوە هەر دەبێت بمرن و دەربازبوونتان نیەو هیچ کەسیش لە ئێوە لە مردن ڕزگاری نابێت. وەك خودای گەورە لە ئایەتێکی تردا دەفەرمووێت: ﴿ كُلُّ مَنْ عَلَيْهَا فَانٍ ﴾[4] هەرکەسێك ژیانی لەسەر زەمینە نامێنێت و دەمرێت. وە دەفەرمووێت: ﴿ كُلُّ نَفْسٍ ذَآئِقَةُ ٱلْمَوْتِ ﴾[5] هەموو کەسێك تامی مردن دەچێژێت. وە دەفەرمووێت: ﴿ وَمَا جَعَلْنَا لِبَشَرٍ مِّن قَبْلِكَ ٱلْخُلْدَ ۖ أَفَإِي۟ن مِّتَّ فَهُمُ ٱلْخَٰلِدُونَ ﴿٣٤﴾ كُلُّ نَفْسٍ ذَآئِقَةُ ٱلْمَوْتِ ﴾[6] وامـــان

---

[1] محمد(٢٠).

[2] الطبري(٨/٥٤٩).

[3] النسائي في الکبری(٦/٣٢٥)، الحکم(٢/٣٠٢) فەرموودەیەکی غەریبە.

[4] الرحمان(٢٦).

[5] ال عمران(١٨٥).

[6] الانبیاء(٣٤- ٣٥).

ئەكرد هیچ مرۆڤێك پێش لە تۆ هەبێتو نەمرێت، ئاخۆ چۆن ئەگەر تۆ بمرێت، ئەوانە تا سەر دەژینن. هەموو گیانێك تامی مردن دەچێژێت. واتە: هەموو كەسێك دەبێت بمرێتو گومانی تێدانیە، هیچ شتێك لە مردن رزگاری ناكات، غەزا بكات یان نەیكات كاتێكی بۆ دیاریكراوە دبێت هە پێی بگات. وەك خالیدی كوڕی وەلید كاتێك كە مردن لەسەر جێگا یەخەی پێدەگرێت دەڵێت: ئامادەی فلانو فلان شەڕ هاتم، شوێنێكم نیە لە لاشەمدا برینێك یان جێی رمێكی پێوەدیار نەبێت، ئەوسا ئێستا لەسەر جێگاكەی خۆم دەمرم. یاخودا هەرگیز ترسنۆكەكان چاونەنێن بەیەكداز خودای گەورەش دەفەرموێت: ﴿أَيْنَمَا تَكُونُوا يُدْرِككُّمُ الْمَوْتُ وَلَوْ كُنتُمْ فِي بُرُوجٍ مُّشَيَّدَةٍ﴾ لە هەر كوێیەك بن، تەنانەت لە قەڵای زۆر قایمیش (خۆتان بشارنەوە) مردن دەتان دۆزێتەوە. واتە: خۆپاراستنو شاردنەوە هیچ سودێكی نیە.

## دووڕووەكان شوومی یان دەدایە پاڵ پێغەمبەر(ﷺ)

خودای بەرز دەفەرموێت: ﴿وَإِن تُصِبْهُمْ حَسَنَةٌ﴾ هەركاتێك چاكەیان دێتە رێ. واتە: هەركاتێك رۆزیو بەروبوومی باخو كشتوكاڵو گوزەرانیان باش بێتو منداڵیان زۆر بێت وەك ئیبنو عەباسو ئەبوعالیەو سوددی وتویانە: ﴿يَقُولُوا هَٰذِهِ مِنْ عِندِ اللَّهِ ۖ وَإِن تُصِبْهُمْ سَيِّئَةٌ﴾ دەڵێن: ئەمە لە خوداوەیە. ئەگەر تووشی ناخۆشیش بوون، واتە:ئەگەر تووشی وشكەساڵیو قاتوقڕی هاتنو باخو كشتوكاڵیان وشك بوو یان منداڵیان مرد یان تووشی هەر شتێكی تر هاتن ﴿يَقُولُوا هَٰذِهِ مِنْ عِندِكَ﴾ دەڵێن: ئەمە لە تۆوەبوو. بەهۆی ئەوەوەبوو بە گوێی تۆمان كردو شوێن ئاینەكەی تۆ كەوتین. وەك خودای گەورە لەبارەی هۆزەكەی فیرعەونەوە دەفەرموێت: ﴿فَإِذَا جَاءَتْهُمُ الْحَسَنَةُ قَالُوا لَنَا هَٰذِهِ ۖ وَإِن تُصِبْهُمْ سَيِّئَةٌ يَطَّيَّرُوا بِمُوسَىٰ وَمَن مَّعَهُ﴾[1] ئەگەر تووشی خۆشی دەبوون دەیانوت: كاری خۆمانە، ئەگەر تووشی بەلاو ناخۆشیش دەهاتن دەیانوت كە: ئەمە شوومی موساو یارانی موسایە. وەك خودای گەورە لە ئایەتێكی تردا دەفەرموێت: ﴿وَمِنَ النَّاسِ مَن يَعْبُدُ اللَّهَ عَلَىٰ حَرْفٍ﴾[2] هەر لەم خەڵكەدا كەسی وا هەیە بە دوودڵی خواپەرستە. ئەم دووڕووانەش كە هاتنە ناو ئاینی ئیسلامەوە خۆیان وا نیشاندەدا كە موسڵمانن بەلام لە دڵدا موسڵمان نەبوون، بۆیە كاتێك كە تووشی شەڕو بەلا ببونایە دەیاندایە پاڵ پێغەمبەر(ﷺ) ئەوانەی شوێنی كەوتبوون. خودای گەورە ئەمەی ناردەخوارەوە: ﴿قُلْ كُلٌّ مِّنْ عِندِ اللَّهِ﴾ بڵێ:(خۆشیو ناخۆشی) هەموو بەدەست خودایە. واتە: هەمووی بە بڕیارو فەرمانی خودایە لە

---

[1] الاعراف(١٣١).

[2] الحج(١١).

پیاوچاكو پیاوخراپو خاوەن باوەڕو خودانەناساندا وەكویەكەو هەرچی بیەوێت دەیكات ﴿فَمَالِ هَٰٓؤُلَآءِ ٱلْقَوْمِ لَا يَكَادُونَ يَفْقَهُونَ حَدِيثًا﴾ ئەرێ ئەمانە چیانە؟ وەك لە هیچ قسەیەك تێنەگەن وایە. پاشان خودای مەزن ڕووی وتاری دەكاتە پێغەمبەرەكەی(ﷺ) مەبەستیشی پێی هەموو ڕەگەزی(جنسی) مرۆڤە. بۆ ئەنجامی وەلامەكەو دەفەرموێت: ﴿مَّآ أَصَابَكَ مِنْ حَسَنَةٍ فَمِنَ ٱللَّهِ﴾ تشی هە چاكەیەك ببن، لە خوداوەیە. واتە: هەر لە ڕێزو سۆزو بەزەیی خوداوەیە ﴿وَمَآ أَصَابَكَ مِن سَيِّئَةٍ فَمِن نَّفْسِكَ﴾ نالەباریشت بێتەڕێ، بزانە لە خۆتەوەیە. واتە: لەلایەن خۆتەوەیەو كرداری خۆتە. وە كخودای گەورە لە ئایەتێكی تردا دەفەرموێت: ﴿وَمَآ أَصَٰبَكُم مِّن مُّصِيبَةٍ فَبِمَا كَسَبَتْ أَيْدِيكُمْ وَيَعْفُواْ عَن كَثِيرٍ﴾[1] هەكاتێك تووشی هەر بەلایەك بوون، بەهۆی كردەوەی خۆتانەو خودا لە زۆر گوناهیشتان چاوپۆشی دەكات. سوددیو حەسەنی بەسریو ئیبنو جورەیجو ئیبنو زید وتیان وتیان: ﴿فَمِن نَّفْسِكَ﴾ واتە: بەهۆی تاوانی خۆتەوەیە. قەتاد لەم ئایەتەدا ﴿فَمِن نَّفْسِكَ﴾ وتی: سزایەكە بۆت، ئەی نەوەی ئادەم بەهۆی گوناهتەوە. پاشان خودای مەزن دەفەرموێت: ﴿وَأَرْسَلْنَٰكَ لِلنَّاسِ رَسُولًا﴾ تۆمان ناردووە كە بەسەر ئەم خەڵكەوە پێغەمبەر بیت. واتە: بەرنامەی خودایان پێ ڕابگەیەنیتو كە ئەوەی خودا پێی ڕازیەو پێی خۆشە بیكەنو ئەوەیش پێی ناخۆشەو پێی ڕازی نیە لێی دووریكەنەوە ﴿وَكَفَىٰ بِٱللَّهِ شَهِيدًا﴾ ئەوەندەت بەسە كە خودا ئاگای لێتە. واتە: شایەتە لەسەر ئەوەی ڕەوانەی كردویو شایەتیشە لە نێوان ئەوانو تۆدا. ئاگاداری ئەوەشە كە تۆ پێت ڕاگەیاندونو ئەوانیش چۆن پشتیان لەو هەقە هەڵكردووە هەر لەبەر لاساریو بێ دینیان.

﴿مَّن يُطِعِ ٱلرَّسُولَ فَقَدْ أَطَاعَ ٱللَّهَ ۖ وَمَن تَوَلَّىٰ فَمَآ أَرْسَلْنَٰكَ عَلَيْهِمْ حَفِيظًا ﴿٨٠﴾ وَيَقُولُونَ طَاعَةٌ فَإِذَا بَرَزُواْ مِنْ عِندِكَ بَيَّتَ طَآئِفَةٌ مِّنْهُمْ غَيْرَ ٱلَّذِى تَقُولُ ۖ وَٱللَّهُ يَكْتُبُ مَا يُبَيِّتُونَ ۖ فَأَعْرِضْ عَنْهُمْ وَتَوَكَّلْ عَلَى ٱللَّهِ ۚ وَكَفَىٰ بِٱللَّهِ وَكِيلًا ﴿٨١﴾﴾

### گوێڕایەڵی پێغەمبەر(ﷺ) گوێڕایەڵی خودایە

خودای مەزن دەفەرموێت: ﴿مَّن يُطِعِ ٱلرَّسُولَ فَقَدْ أَطَاعَ ٱللَّهَ﴾ هەركەسێك بە فەرمان پێغەمبەرە دیارە بە فەرمانی خودایە. خودا گورە باسی بەدەو پێغەمبەری خۆی محمد(ﷺ) دەكاتو دەفەرموێت هەركەسێك گوێڕایەڵی ئەو بكات ئەوا گوێڕایەڵی خودای كردوو هەركەسێكیش سەرپێچی

[1] الشورى(٣٠).

بکات ئەوا سەرپێچی خودای کردووە، چونکە پێغەمبەر(ﷺ) لە خۆیەوە قسەناکات. بەڵکو بە نیگای خودا قسەدەکاتو بە ئاگاداری ئەوە. ئیبنو ئەبی حاتەم ڕیوایەتی کردووە لە ئەبوهورەیرەوە وتی: پێغەمبەری خودا(ﷺ) فەرموویەتی:(هەرکەسێك بەرفەرمانی من بێت ئەوە بەرفەرمانی خودای کردووە، هەرکەسێکیش سەرپێچی منی کرد ئەوە سەرپێچی خودای کردووە، وە هەرکەسێك گوێڕایەڵی فەرمانڕەواکەی بکات ئەوە گوێڕایەڵی منی کردووە، وە هەرکەسێك سەرپێچی فەمانڕەواکەی بکات ئەوە سەرپێچی منی کردووە)[1] ئەم فەرموودەیە لە هەردوو سەحیحەکەشدا هاتووە[2] ﴿وَمَن تَوَلَّىٰ فَمَآ أَرۡسَلۡنَٰكَ عَلَيۡهِمۡ حَفِيظٗا﴾ هەرکەسێکیش خۆی لێ ببوێرێت(پشت هەڵبکات) ئێمە تۆمان بۆ ئەوە نەناردووە کە لەسەریان چاودێربیت. واتە: تۆ هەر ئەوەت لەسەرە کە پێیان ڕابگەیەنیت، هەرکەسێك شوێنتکەوت بەختەوەرو ڕزگارە. بە ئەندازەی ئەوکەسەش کە شوێنت دەوێت پاداشتت بۆ دەنوسرێت، هەرکەسێکیش پشتت تێبکات ڕەنجەڕۆو ماڵ وێرانە، تۆ هیچ کارێکت بەسەرەوە نەبێت. وەك لەم فەرموودەیەدا هاتووە:(هەرکەسێك گوێڕایەڵی خوداو پێغەمبەرەکەی بکات(ﷺ) ئەوە ڕاستەڕێی گرتووەتەبەر، هەرکەسێکیش سەرپێچی خوداو پێغەمبەرەکەی بکات(ﷺ) بێگومان ئەوکەسە تەنیا زیان لە خۆی دەدات)[3].

### باسی گەوجێتی و گەمژەیی دووڕووەکان

خودای مەزن دەفەرمووێت: ﴿ وَيَقُولُونَ طَاعَةٞ ﴾ لەناو ئەوانەدا کەسانێك هەن دەڵێن: ئێمە هەرگیز لە فەرمانی تۆ دەرناچین. خودای گەورە لێرەدا باسی دووڕووەکان دەکات کە وای نیشاندەدەن لە فەرمان پێغەمبەر دەرناچن ﴿فَإِذَا بَرَزُواْ مِنۡ عِندِكَ﴾ بەڵام کاتێك لەلات دەڕۆنو دووردەکونەوە ﴿بَيَّتَ طَآئِفَةٞ مِّنۡهُمۡ غَيۡرَ ٱلَّذِي تَقُولُ﴾ بە پێچەوانەی فەرمانی تۆ (شەوانە ڕاوێژدەکەن). واتە: ئەوەی بەشەودا دەیڵێن دەیشارنەوە لێت(باسی ناکەن بۆت) خودای گەورەش دەفەرمووێت: ﴿وَٱللَّهُ يَكۡتُبُ مَا يُبَيِّتُونَ﴾ هەر خاڵێك لە شەودا بە دڵیاندادێت، خودا دەینوسێت. واتە: هەرچی بڵێن خودا لێی ئاگادارەو ئەو چاودێرانە کە بەرپرسیارن لە نوسینی کرداری بەندەکان هەمووی دەنوسنو دەزانن چی دەکەن.ئەمە هەڕشەیە لوە دووڕووانە کە خودا هیچی لێ ناشارێتەوە دەزانێت چی لە نێوان خۆیاندا دەڵێنو چیش لە دڵیاندایەو ئەویش لەسەری هاوڕان لەسەر دژایەتیکردنی پێغەمبەر(ﷺ) لە شەوداو

---

[1] أحمد(٢٥٢/١) فەرموودەیەکی سەحیحە.

[2] فتح الباري(١٣٥/٦)، مسلم(١٤٦٦/٣).

[3] مسلم(٥٩٤/٢).

سەرپێچی کردنی. هەرچەندە بە ڕواڵەت وای نیشاندەدەن کە گوێڕایەڵن و لە قسەی دەرناچن. بەمزوانە خودا سزای توندیان دەدات لەسەر ئەو ڕەفتارەیان. وەك خودای گەورە لە ئایەتێکی تردا دەفەرمووێت: ﴿ وَيَقُولُونَ ءَامَنَّا بِٱللَّهِ وَبِٱلرَّسُولِ وَأَطَعْنَا ﴾[1] دەڵێن: ئێمە بڕوامان بە خوداو پێغەمبەر هێناوەو بەرفەرمانین. خودای گەورە لێردا دەفەرمووێت: ﴿فَأَعْرِضْ عَنْهُمْ﴾ تۆش وازیان لێبێنە. واتە: تۆش ئەی محمد(ﷺ) چاوپۆشیان لێبکەو لەسەرخۆبە لەگەڵیان و زۆر سەرزەنشتیان مەکەو نهێنیەکانیان بۆ خەڵکی ئاشکرا مەکەو لێشیان مەترسە ﴿وَتَوَكَّلْ عَلَى ٱللَّهِ ۚ وَكَفَىٰ بِٱللَّهِ وَكِيلًا﴾ خۆت هەر بەخودا بسپێرەو کارسازت خودابێت بەستە. واتە: خودابەسە دۆستو پشتیوان و یارمەتیدەرێت بۆکەسێك بیەوێت پشت بە خودا ببەستێت و هانا بۆ ئەوببات.

﴿ أَفَلَا يَتَدَبَّرُونَ ٱلْقُرْءَانَ ۚ وَلَوْ كَانَ مِنْ عِندِ غَيْرِ ٱللَّهِ لَوَجَدُوا۟ فِيهِ ٱخْتِلَٰفًا كَثِيرًا ﴿٨٢﴾ وَإِذَا جَآءَهُمْ أَمْرٌ مِّنَ ٱلْأَمْنِ أَوِ ٱلْخَوْفِ أَذَاعُوا۟ بِهِۦ ۖ وَلَوْ رَدُّوهُ إِلَى ٱلرَّسُولِ وَإِلَىٰٓ أُو۟لِى ٱلْأَمْرِ مِنْهُمْ لَعَلِمَهُ ٱلَّذِينَ يَسْتَنۢبِطُونَهُۥ مِنْهُمْ ۗ وَلَوْلَا فَضْلُ ٱللَّهِ عَلَيْكُمْ وَرَحْمَتُهُۥ لَٱتَّبَعْتُمُ ٱلشَّيْطَٰنَ إِلَّا قَلِيلًا ﴿٨٣﴾ ﴾

**ئەم قورئانە هەقەو کتێبی خودایە**

خودای مەزن فەرمان دەکات بە خاوەن باوەڕان کە وردببنەوە لە قورئان و باش سەرەنجی بدەن. لێی قەدەغەکردوون پشتی تێبکەن باش سەیری مانابتەوەکان و وتە ڕەوانەکانی نەکەن پێشی ڕاگەیاندوون کە هیچ شتێکی دژ یەکتری تێدانیەو بێ کەموکوڕیە، چونکە لەلایەن لە کارزانی هەمیشە ستایش کراوە وە هاتووەتەخوارەوە. قورئان خۆی هەقەو لەلایەن هەقیشەوە هاتووە. هەربۆیە خودای مەزن دەفەرمووێت: ﴿ أَفَلَا يَتَدَبَّرُونَ ٱلْقُرْءَانَ أَمْ عَلَىٰ قُلُوبٍ أَقْفَالُهَآ ﴾[2] ئایا ئەوان لە قورئان وردنابنەوەو سەرەنجی نادەن، یان دڵیان داخراوە؟ پاشان دەفەرمووێت: ﴿وَلَوْ كَانَ مِنْ عِندِ غَيْرِ ٱللَّهِ لَوَجَدُوا۟ فِيهِ ٱخْتِلَٰفًا كَثِيرًا ﴾ ئەگەر قورئان هی کەسێکی تر بووایە جگە لە خودا دیارە مەبەستی ناڕێك و دژیەیەکتریان زۆر تێدا پەیدادەبوو. واتە: ئەگەر کاری کەسێك بووایەو دروست بکرایە وەك بت پەرستەنەفامەکان و دووڕووەکان دەیانوت شتی دژیەیەکی زۆری تێدادەبوو، بەڵام ڕوون و ئاشکرایە کە ئەم قورئانە شتی دژیەیەکی تێدانیەو بێ گەردە لەلایەن خوداوە هاتووە. وەك خودای گەورە باسی

---

[1] النور(٤٧).

[2] محمد(٢٤).

ئەوانە دەکات کە زۆر زانانو دەفەرمووێت: ﴿وَٱلرَّٰسِخُونَ فِي ٱلۡعِلۡمِ يَقُولُونَ ءَامَنَّا بِهِۦ كُلٞ مِّنۡ عِندِ رَبِّنَا﴾[1] ئەوکەسانەش کە زۆر زانان دەڵێن: بڕوامان پێی هەیەو ئەمانە گشتی لە پەروەردگارمانەوەیە. واتە: دەڵێن: چەندین ئایەتی پتەو هەن(محكمة) کەمانی بۆ ئەم قورئانەو تێشیدایە لەیەکدەچن(متشابهات) کە هەموو ڕاستن. بۆیە ئەم زانایانە ئایەتە لێکچووەکان دەگێڕنەوە بۆلای ئایەتە پتەوەوکاو(المحكمات) شارەزا دەبن. بەڵام ئەوانەی دەغەزو نەخۆشی لە دڵیاندایە ئایەتە پتەوەکان(المحكم) گێڕاوەتەوە بۆلای ئایەتە لێکچووەکان(المتشبه) گومڕابوونو سەریان لێ شێواوە. هەربۆیە خودای گەورە وەسفی زۆرزاناکانی کردووەو زەمی گومڕاکانیشی کردووە. ئیمامی ئەحمەد ڕیوایەتی کردووە لە عەمری کوڕی شوعەیبەوە لە باوکیەوە لە باپیریەوە وتی: منو براکەم لە کۆمەڵێکدا دانیشتبووین بە ئەندازی وشتری سور(حمرالنعم) کە هەبێت لەلام خۆشەویستربوو. منو براکم چووین گەیشتین بە چەند پیاوێکی بەڕێز لە هاوەڵەکانی پێغەمبەری خودا(ﷺ) لە دەرگایەکدا لە دەرگاکانی، پێمان ناخۆشبوو لە یەکتری جیابکەینەوە لە سوچێکدا دانیشتین لەوکاتەدا باسی ئایەتێکی قورئانسیان دەکرد، مشتومڕیان بوو لەسەری و دەنگیان بەرزبووەوە. بە تووڕەییەوە پێغەمبەری خودا(ﷺ) هاتەدەرەوە بۆیانو ڕەنگی ڕووی سوربووبووەوە خۆڵی دەکرد بەسەریانداو دەیفەرموو:(ئارام بن ئەی خەڵکینە هەر بەم شێوەیە گەلەکانی پێش ئێوە لەناوچوون لەسەر ناکۆکیان دەربارەی پێغەمبەرەکانیانو کتێبەکانیانو بەراوردی یەکتریان پێ دەکردن. بێگومان ئەم قورئانە نەهاتووەتەخوارەوە هەندێکی ئەوی تری بە درۆ بخاتەوە، بەڵکو هەندێکی ڕاستی ئەوی تری دەسەلمێنێت، ئەوەی لێی تێگەیشتنو فێری بوون لێی کاری پێ بکەن. ئەوەشی لێی تێنەگەیشتن بیگێڕنەوە لای زانیارەکەی)[2] دیسان ئیمامی ئەحمود ڕیوایەتی کردووە لە عەبدوڵای کوڕی عەمرەوە وتی: ڕۆژێك لەکاتی گەرمادا چووم بۆلای پێغەمبەری خودا(ﷺ) ئێمە دانیشتبووین لەوکاتەدا دووکەس ناکۆکیان هەبوو لە ئایەتێکداو دەنگیان بەرزبووەوە پێغەمبەر(ﷺ) فەرمووی:(بێگومان گەلەکانی پێش ئێوە لوناوچوون بەهۆی جیاوازیو ناکۆکیان لە کتێبی خودا)[3] ئەم فەرموودەیە موسلیمو نەسائیش ڕیوایەتیان کردووە[4].

---

[1] ال عمران(٧).

[2] أحمد(١٨١/٢) فەرموودەیەکی حەسەنە.

[3] أحمد(١٩٢/٢) فەرموودەیەکی سەحیحە.

[4] مسلم(٢٠٥٣/٤)، النسائي في الكبرى(٣٣/٥).

## قەدەغەكردنی بڵاوكردنەوەی هەواڵ بێ لێكۆڵینەوە

خـودای مـەزن دەفـەرموێت: ﴿ وَإِذَا جَآءَهُمْ أَمْرٌ مِّنَ ٱلْأَمْنِ أَوِ ٱلْخَوْفِ أَذَاعُوا۟ بِهِۦ ﴾ هـەركاتێك سەبارەت بە هێمنایەتی یان مەترسی، هەواڵێكمان پێدەگات بڵاوی دەكەنەوە. ئەمە نیگەرانی دەربڕینە دەربارەی ئەوكەسانەی كە پەلە دەكەن لە بڵاوكردنەوەی هەواڵ پێش لێكۆڵینەوە لێیو دەیگەیەنن بە هەموو لایەكدا، لەوانەیە ئەو قسەیە دووربێت لـە ڕاستیەوە. موسلیم ڕیوایەتی كردووە لـە پێشەكی سەحیحەكەیدا لە ئەبوهورەیرەوە لە پێغەمبەری خودا(ﷺ) فەرموویەتی:(بەسە بۆ مرۆڤ بە درۆزن دابنرێت كـە هەرچـی بیست بیگێڕێتـەوە)[1] ئـەبوداودیش ڕیوایـەتی كـردووە لـە(كتـاب الادب) دا لـە سونەنەكەیدا[2] وە لە هـەردوو سـەحیحكەدا هـاتووە لـە موغـیرەی كوڕی شـەعبەوە: كـە پێغەمبـەری خودا(ﷺ) قەدەغەی كردووە لە وتـراوەو وتیـان[3] واتـە: ئـەوەی زۆر قـسەی خـەڵكی دەگێڕێتـەوە بـێ ئـەوەی لێـی بكۆڵێتـەوەو بـیری لـێ بكاتـەوە بزانێـت ئـەم قـسەیە ڕاسـتە یان نـا. وە لـە فـەرموودە سەحیحەكەدا هاتووە:(كەسێك قسە بگێڕێتەوە، خۆی بزانێت(ببینێت) ئەو قـسەیە درۆیـە، ئـەوە خـۆی یەكێكە لەو دوو درۆزنە)[4] وە لێرەدا ئێمە ئەو قسەی عومەری كوڕی خەتابە باس دەكەین كە لە هەردوو سەحیحەكەدا هاتووە كاتێك هەواڵی درایە كە پێغەمبەری خودا(ﷺ) خێزانـەكانی تەڵاقـداوە، لـە ماڵی خۆیانەوە هاتو چووە ناو مزگەوت بینی خەڵكی ئەو قسەیە دەكەن، خۆی پێنەگیرا هـەتا داوای ئیزنـی كرد كە بچێتەلای پێغەمبەر(ﷺ) لێی پرسـی وتـی: ئایا خێزانـەكانت تەڵاقـداوە؟ فـەرمووی:(نـەخێر)، وتـی: وتم الله أكبر، فەرموودەكـەی بـە درێـژی باسـكرد. لـە سـەحیحی موسـلیمدا هـاتووە وتم: ئایا تەڵاقتداون؟ فەرمووی:(نەخێر) عومەر وتی: لەسەر دەرگاكانی مزگەوت ڕاوەستامو بە بەرزترین دەنگی خـۆم هـاوارم كـرد كـە پێغەمبـەری خـودا(ﷺ) خێزانـەكانی تـەڵاق نـەداوە. پاشـان ئـەم ئایەتـە هاتــــەخوارەوە: ﴿ وَإِذَا جَآءَهُمْ أَمْرٌ مِّنَ ٱلْأَمْنِ أَوِ ٱلْخَوْفِ أَذَاعُوا۟ بِهِۦ ۖ وَلَوْ رَدُّوهُ إِلَى ٱلرَّسُولِ وَإِلَىٰٓ أُو۟لِى ٱلْأَمْرِ مِنْهُمْ لَعَلِمَهُ ٱلَّذِينَ يَسْتَنۢبِطُونَهُۥ مِنْهُمْ ﴾ هـەركاتێك سـەبارەت بـە هێمنـایی یـان مەترسـی، دەنگو باسێكیان پێدەگات، سـەربەخۆ لـەلای هەمووكـەس بـڵاوی دەكەنـەوە. ئەگـەر هـەر لـەلای پێغەمـەرو كاربەدەستەكانی خۆیان باسیان بكردایە، دەیانزانی ڕاستەقینەكەی كامەیەو ئـەو جـۆرە هەواڵانـە لـە

---

[1] مسلم(١/١٠).

[2] أبوداود(٥/٢٢٦) فەرموودەیەكی سەحیحە.

[3] مسلم(٥)، أبوداود(٤٩٩٢).

[4] مسلم(١/٩).

کوێوه سەریان هەڵداوە. عومەر وتی: ئەوە من بووم ناڕاستی ئەو هەواڵەم زانی[1] پاشان خودای گەورە دەفەرمووێت: ﴿وَلَوْلَا فَضْلُ اللَّهِ عَلَيْكُمْ وَرَحْمَتُهُ لَاتَّبَعْتُمُ الشَّيْطَانَ إِلَّا قَلِيلًا﴾ وە ئەگەر چاکەو بەزەیی خودا نەبووایە بەرامبەر بە ئێوە(کەماتن نەبێت) دەبوونە شوێنکەوتەی شەیتان. عەلی کوڕی ئەبو تەلحە لە ئیبنو عەباسەوە وتی: مەبەست پێی خاوەن باوەڕانە[2].

﴿فَقَاتِلْ فِي سَبِيلِ اللَّهِ لَا تُكَلَّفُ إِلَّا نَفْسَكَ ۚ وَحَرِّضِ الْمُؤْمِنِينَ ۖ عَسَى اللَّهُ أَن يَكُفَّ بَأْسَ الَّذِينَ كَفَرُوا ۚ وَاللَّهُ أَشَدُّ بَأْسًا وَأَشَدُّ تَنكِيلًا ﴿٨٤﴾ مَّن يَشْفَعْ شَفَاعَةً حَسَنَةً يَكُن لَّهُ نَصِيبٌ مِّنْهَا ۖ وَمَن يَشْفَعْ شَفَاعَةً سَيِّئَةً يَكُن لَّهُ كِفْلٌ مِّنْهَا ۗ وَكَانَ اللَّهُ عَلَىٰ كُلِّ شَيْءٍ مُّقِيتًا ﴿٨٥﴾ وَإِذَا حُيِّيتُم بِتَحِيَّةٍ فَحَيُّوا بِأَحْسَنَ مِنْهَا أَوْ رُدُّوهَا ۗ إِنَّ اللَّهَ كَانَ عَلَىٰ كُلِّ شَيْءٍ حَسِيبًا ﴿٨٦﴾ اللَّهُ لَا إِلَٰهَ إِلَّا هُوَ ۚ لَيَجْمَعَنَّكُمْ إِلَىٰ يَوْمِ الْقِيَامَةِ لَا رَيْبَ فِيهِ ۗ وَمَنْ أَصْدَقُ مِنَ اللَّهِ حَدِيثًا ﴿٨٧﴾﴾

**خودا فەرماندەکات بە پێغەمبەرەکەی(ﷺ) کە خۆی بچێت بۆ غەزا**

خودای مەزن دەفەرمووێت: ﴿فَقَاتِلْ فِي سَبِيلِ اللَّهِ﴾ تۆ لەسەرتە لە ڕێی خودادا بچیت بۆ غەزا. خودای گەورە فەرمان دەکات بە بەندەو پێغەمبەرەکەی خۆی محمد(ﷺ) کە خۆی بچێت بۆ غەزا، هەرکەسێك خۆی گرتەدواو لەگەڵی نەچوو بۆ غەزا وازی لێبێنێت. هەربۆیە خودای گەورەش دەفەرمووێت: ﴿لَا تُكَلَّفُ إِلَّا نَفْسَكَ﴾ تۆ هەر ئەرکی(تکلیف) ی خۆت لەسەرە. ئیبنو ئەبی حاتەم ڕیوایەتی کردووە لە لە ئەبو ئیسحاقەوە وتی: پرسیارم لە بەڕائی کوڕی عازەب کرد دەربارەی ئەو پیاوەی کە ڕووبەڕووی سەد پیاوی دوژمن دەبێتەوە، ئایا شەڕی کرد لەوکەسانە دەژمێردرێت کە خودای گەورە دەفەرمووێت: ﴿ تُلْقُوا بِأَيْدِيكُمْ إِلَى التَّهْلُكَةِ﴾[3] خۆتان توشی مەترسیو تیاچوون مەکەن بە دەستی خۆتان. وتی خودای مەزن فەرموویەتی بە پێغەمبەرەکەی(ﷺ) ﴿فَقَاتِلْ فِي سَبِيلِ اللَّهِ لَا تُكَلَّفُ إِلَّا نَفْسَكَ ۚ وَحَرِّضِ الْمُؤْمِنِينَ﴾ تۆ لەسەرتە لە ڕێی خودادا بچیت بۆ غەزاو تۆ هەر ئەرکی خۆت لەسەرەو هانی خاوەن باوەڕانیش بدە. ئیمامی ئەحمەد ڕیوایەتی کردووە لە سولەیمانی کوڕی داودەوە لە ئەبوبەکری کوڕی عەیاشەوە لە ئەبو ئیسحاقەوە وتی: وتم بە بەڕاء: ئەو پیاوە پەلاماری بت پەرستان دەدات، ئایا لەوکەسانە دەژمێردرێت کە خۆی دەخاتە مەترسیو تیاچوونەوە؟ نەخێر،

---

[1] فتح الباری(١٨٧/٩)، مسلم(١١٠٥/٢).

[2] الطبری(٥٧٥/٨).

[3] البقرة(١٩٥).

چوونکە خودای مەزن پێغەمبەرەکەی(ﷺ) ڕەوانەکردووەو دەفەرمووێت: ﴿فَقَٰتِلۡ فِي سَبِيلِ ٱللَّهِ لَا تُكَلَّفُ إِلَّا نَفۡسَكَ﴾ بێگومان ئەو ئایەتەی کە خودای گەورە دەفەرمووێت: ﴿ تُلۡقُواْ بِأَيۡدِيكُمۡ إِلَى ٱلتَّهۡلُكَةِ﴾ لەبارەی ماڵ بەخشینەوە هاتووەتەخوارەوە[1].

## هاندانی خاوەن باوەڕان بۆ غەزاکردن

خودای مەزن دەفەرمووێت: ﴿وَحَرِّضِ ٱلۡمُؤۡمِنِينَ﴾ وە هانی خاوەن باوەڕانیش بدەن، واتە: بۆ غەزاکردن‌و ورەیان بخەرەبەر، وەك لە ڕۆی بەدردا پێغەمبەری خودا(ﷺ) کاتێك کە ڕیزەکانی ڕێك دەکردن پێ وتن:(هەستن بۆ دەستخستنی ئەو بەهەشتەی کە پانتاییەکەی ئاسمان‌و زەویە)[2] فەرموودەی زۆر هاتووە لەسەر هاندانی خاوەن باوەڕان بۆ غەزاکردن. لەو فەرموودانە بوخاری ڕیوایەتی کردووە لە ئەبوهوریرەوەو وتی: پێغەمبەری خودا(ﷺ) فەرموویەتی: (هەرکەسێك بڕوا بە خوداو پێغەمبەرەکەی بێنێت‌و نوێژ بکات‌و زەکات بدات‌و ڕۆژوی ڕەمەزان بگرێت، خودای مەزن کردوویەتی بەهەق بەسەرخۆیەوە کە بیخاتە بەهەشت کۆچ بکات لە ڕێی خودادا یان دابنیشێت لەو خاك‌و وڵاتەی کە تێیدا لە دایك بووە)، وتیان:ئەی پێغەمبەری خودا(ﷺ) مژدە بدەین بەخەڵکی؟ ئەویش فەرمووی:(لەناو بەهەشتدا سەد پلە هەیە ئامادەی کردووە بۆ ئەوکەسانەی کە غەزا دەکەن لەپێناوی خودادا، نێوان هەر دوو پلەیەك بە ئەندازەی نێوان زەوی‌و ئاسمانە ئەگەر داواتانکرد لە خودا داوای فیردەوس بکەن چونکە ناوەڕاستی بەهەشتەو بەرزترین شوێنی بەهەشتە، لە سەروی ئەوەوە تەختی(عەرشی) خودایەو لەوێوە ڕووبارەکانی بەهەشت هەڵدەقوڵێن)[3] لە فەرموودەکەی عوبادەو مەعازو ئەبو دەدائیشەوە[4] هەر بەم شێوەیە ڕیوایەت کراوە. وە لە ئەبو سەعیدی خودەریەوە کە پێغەمبەری خودا(ﷺ) فەرموویەتی:(ئەی ئەبو سەعید کەسێك ڕازی بوو بێت کە خودا پەروەردگاریەتی‌و ئیسلام ئاینیەتی‌و محمد(ﷺ) ڕاسپاردەو پێغەمبەرێتی بەهەشتی بۆدەبێت) واتە: شوێنی ئەوکەسە بەهەشتە. ئەبو سەعید سەری لەوە سوڕماوە، وتی: ئەی پێغەمبەری خودا(ﷺ) لەسەر منیش دابێت(حساب بکە) ئەویش کردی. پاشان پێغەمبەری خودا(ﷺ) فەرموویەتی:(شتی تریش خودا بەندەکانی پێ بەرزدەکاتەوە لە بەهەشتدا سەد پلە هەیە، لە نێوان هەر دوو پلەدا وەك

[1] أحمد(٤/٢٨١) فەرموودەیەکی سەحیحە.

[2] مسلم(٣/١٥١٠).

[3] فتح الباري(٦/١٤).

[4] تحفة الاحوذي(٧/٢٣٧) فەرموودەیەکی سەحیحە.

[5] ابن ماجه(٢/١٤٤٨) فەرموودەیەکی سەحیحە.

نێوان ئاسمان‌و زەویە)[1] موسلیم ڕیوایەتی کردووە. پاشان خودای گەورە دەفەرموێت: ﴿عَسَى ٱللَّهُ أَن يَكُفَّ بَأْسَ ٱلَّذِينَ كَفَرُوا۟﴾ بەڵكو خودا لە بەدفەری‌و زەبروزەنگی خودانەناسان بتانپارێزێت. واتە ئەی پێغەمبەر(ﷺ) بەڵكو بەهۆی هاندانی تۆوە كە دەیاندەیت بۆ غەزاكردن، تینیان تێ بكەوێت‌و بچن بەگژ دوژمنداو بەرەنگاریان ببنەوەو خۆڕاگرین لە ناوچەی ئیسلام‌و خەڵكەكەی دووریان بخەنەوە.

﴿وَٱللَّهُ أَشَدُّ بَأْسًا وَأَشَدُّ تَنكِيلًا﴾ خودا لەوان بەهێزترو تواناترەو لە بەلابەسەرهێنانیش لەوان بەدەست‌و بردترە. واتە: خودا دەستەلاتی هەیە بەسەریاندا لە دونیاو لە ڕۆژی قیامەتیشدا. وەك خودای گەورە لە ئایەتێكی تردا دەفەرموێت: ﴿ذَٰلِكَ وَلَوْ يَشَآءُ ٱللَّهُ لَٱنتَصَرَ مِنْهُمْ وَلَٰكِن لِّيَبْلُوَا۟ بَعْضَكُم بِبَعْضٍ﴾[2] ئەگەر خودا بیویستایە خۆی تۆڵەی لێ دەسەندن بەلام ویستی تاقیان بكاتەوە بە یەكتری.

## تكاكردنی چاك‌و تكاكردنی خراپ

خودای مەزن دەفەرموێت: ﴿ مَّن يَشْفَعْ شَفَٰعَةً حَسَنَةً يَكُن لَّهُۥ نَصِيبٌ مِّنْهَا﴾ هەركەسێك ببێتە تكاكارو تاكی بۆ كاری چاكە بێت، خۆشی بەشی تێدا هەیە. واتە: هەركەسێك هەوڵی كاری چاك بداتو هەوڵەكەی سەربگرێت، ئەوە خۆشی بەشی لەو چاكەیەدا هەیە ﴿وَمَن يَشْفَعْ شَفَٰعَةً سَيِّئَةً يَكُن لَّهُۥ كِفْلٌ مِّنْهَا﴾ هەركەسێكیش تكا بۆ خراپە بكات، ئەویش بەشی لە خراپەكەدا پێدەگات. واتە: ئەویش تاوانبار دەبێت لەسەر ئەو خراپەی بەهۆی ئەوەوە ڕوودەدات. وەك لە فەرمووده سەحیحەكەدا هاتووە كە پێغەمبەری خودا(ﷺ) فەرموویەتی:(تكابكەن پاداشتی وەردەگرن، خودا لەسەر زمانی پێغەمبەرەكەی(ﷺ) مەیلی لە هەرشتێك بێت بڕیاری لەسەر دەدات)[3] موجاهیدی كوڕی جەبر وتی: ئەم ئایەتە لەسەر تكاكردنی خەڵكی بۆ یەكتری هاتووەتەخوارەوە.[4] ﴿وَكَانَ ٱللَّهُ عَلَىٰ كُلِّ شَىْءٍ مُّقِيتًا﴾ خودا بەسەر هەموو شتێكدا توانای هەیە. ئیبنو عەباس‌و عەتاو عەتیەو قەتادەو مەترل وەڕاق(مطر

---

[1] مسلم(٣/١٥٠١).

[2] محمد(٤).

[3] فتح الباری(٣/٣٥١).

[4] الطبری(٨/٥٨١).

الوراق) وتيان: ﴿مُقِيتًا﴾ واتەك چاودێرە[1] موجاهد وتی: شايەتە. لە ڕيوايەتێكی تردا موجاهد وتويەتی: (حَسِيبًا) واتە: دەپرسێتەوە[2].

### فەرماندان بە وەڵامدانەوەی سەلام بە چاكتر لە خۆی

خودای مەزن دەفەرموێت: ﴿وَإِذَا حُيِّيتُم بِتَحِيَّةٍ فَحَيُّوا بِأَحْسَنَ مِنْهَا أَوْ رُدُّوهَا إِنَّ اللَّهَ كَانَ عَلَىٰ كُلِّ شَيْءٍ حَسِيبًا﴾ هەركەسێك چاكوچۆنيتان لێ دەكات، ئێوە چاكتر چاكوچۆنی لەگەڵدا بكەن. واتە: وەكو ئەو وەڵامی بدەنەوە. بێگومان خودا دەپرسێتەوەو چاودێرە بەسەر هەموو شتێكدا. واتە: كاتێك موسڵمانان سڵاوتان لێدەكات بە جوانترين شێوە وەڵامی سڵاوەكەی بدەنەوە، يان هيچ نەبێت وەكو خۆی وەڵامی بدەنەوە. بەچاكتر وەڵامدانەوە سوننەتەو وەك خۆشی فەرزە. ئيمامی ئەحمەد ڕيوايەتی كردووە لە ئەبو ڕەجائی عەتاريديەوە(العطاريدی) لە عيمرانی كوڕی حوسەينەوە(حصين) كە پياوێك هات بۆلای پێغەمبەری خودا(ﷺ) وتی:(السلام عليكم)، پێغەمبەر(ﷺ) وەڵامی دايەوە، پاشان دانيشت، پێغەمبەر(ﷺ) فەرمووی:(دە(عشر)) پاشان يەكێكی ترمان وتی: (عليكم السلام ورحمةالله) ئەی پێغەمبەری خودا(ﷺ) وەڵامی دايەوەو پاشان دانيشت. پێغەمبەر(ﷺ) فەرمووی:(بيست(عشرين))، پاشان يەكێكی تر هاتو وتی: (عليكم السلام ورحمةالله وبركاته)، پێغەمبەر(ﷺ) وەڵامی دايەوەو دانيشت، فەرمووی: (سی (ثلاثون))[3] هەر بەم شێوەيە ئەبوداودو تيرميزیو نەسائیو بەزار(البزار) ڕيوايەتيان كردووە لە ئەبو سەعيدو عەلیو سەهلی كوڕی حونەيفەوە(حُنيف)[4] تيرميزی وتی: فەرموودەيەكی حەسەنی غەريبە. كاتێك كە موسڵمان ئەوەی كە ئيسلام دايناوە لە سڵاوكردندا بەجێی هێنا، تۆش لەسەرتە وەكو ئەو وەڵامی بدەيتەوە. ديارە فەرمانەكەت بەجێ هێناوە. بەڵام لەيارەی ئەهلی زيمەوە لەپێشدا سڵاويان لێ ناكرێتو زيادەش وەڵام نادرێنەوە. بەڵكو بەو شێوەيە وەڵام دەدرێنەوە كە لە هەردوو سەحيحەكەدا هاتووە لە ئيبنو عومەرەوە كە پێغەمبەری خودا(ﷺ) فەرموويەتی:(كاتێك كە جولەكە سڵاوی لێكردن بێگومان هی وايان هەيە دەڵێت:(السام عليك) تۆش بڵێ: (وعليك)[5](السام) واتە: مردن. وە لە سەحيحی موسليمدا هاتووە لە ئەبوهورەيرەوە وتی: پێغەمبەری خودا(ﷺ) فەرموويەتی:(لە پێشدا ئێوە سەلام لە گاورو

---

[1] الطبری(٥٨٣/٨).

[2] الطبری(٥٨٣/٨).

[3] أحمد(٤٣٩/٤) فەرموودەيەكی سەحيحە.

[4] أبوداود(٣٧٩/٥)، تحفة الاحوذي(٤٦٣/٧)، كشف الاستار(٤١٨/٢) فەرموودەيەكی سەحيحە.

[5] فتح الباری(٢٩٣/١٢)، مسلم(١٧٠٦/٤).

جولەکە مەکەن، ئەگەر لە ڕێگەدا پێیان گەیشتن ناچاریان بکەن بۆ تەنگترینی ڕێگەکە)[1] وە لەو فەرموودەدا کە ئەبوداود ڕیوایەتی کردووە بە سەنەدی خۆی بۆ ئەبوهورەیرە وتی: پێغەمبەری خودا(ﷺ) فەرموویەتی:(سوێند بەوکەسەی گیانی منی بەدەستە، ناچنە بەهەشت هەتا باوەڕ نەهێنن، باوەڕیش ناهێنن، هەتا یەکترتان خۆشنەوێت، ئایا شتێکتان پێ بڵێم ئەگەر بیکەن یەکترتان خۆشدەوێت؟ سەلام لە یەکتری زۆر بکەن)[2] پاشان خودای گەورە دەفەرموێت: ﴿ٱللَّهُ لَآ إِلَٰهَ إِلَّا هُوَ﴾ جگە لە خودا هیچ شتێك بۆ پەرستن نابێت. خودای مەزن لێرەدا ئاگادارمان دەکاتەوە کە تاکو تەنیایە هیچ شتێك بۆ پەرستن ناشێت هەموو دەبێت ئەو بپەرستن‌و سوێندش دەخوات کە هەموو لە ڕۆژی قیامەتدا کۆدەکاتەوە وەك دەفەرموێت: ﴿لَيَجۡمَعَنَّكُمۡ إِلَىٰ يَوۡمِ ٱلۡقِيَٰمَةِ لَا رَيۡبَ فِيهِ﴾ لە ڕۆژی قیامەتدا(کە هاتنی بێگومانە) کۆدەکاتەوە. ئەم لامە لە ﴿لَيَجۡمَعَنَّكُمۡ﴾ دایە، سەلامی سوێندە(سەلامی قەسەمە). خودای گەورە کە دەفەرموێت: ﴿لَآ إِلَٰهَ إِلَّا هُوَ﴾ هەواڵیشە و سوێندیشی لەگەڵدایە. کە لە ڕۆژی قیامەتدا لەسەرەتاوە هەتا ڕۆژی دوایین کەس لەیەك شوێندا کۆدەکاتەوە، هەرکەسەو پاداشتی کردەوەی خۆی وەردەگرێت. پاشان دەفەرموێت: ﴿وَمَنۡ أَصۡدَقُ مِنَ ٱللَّهِ حَدِيثٗا﴾ جا قسەی کێ لە قسەی خودا ڕاسترە؟ واتە: هیچ کەسێك نیە قسەی لە قسەی خودا ڕاستر بێت لە هەواڵ‌و بەڵێن‌و هەڕەشەیدا، هیچ پەرستراوێك نیە جگە لە خوداو هەر ئەویش پەروەردگاریە.

﴿فَمَا لَكُمۡ فِي ٱلۡمُنَٰفِقِينَ فِئَتَيۡنِ وَٱللَّهُ أَرۡكَسَهُم بِمَا كَسَبُوٓاْۚ أَتُرِيدُونَ أَن تَهۡدُواْ مَنۡ أَضَلَّ ٱللَّهُۖ وَمَن يُضۡلِلِ ٱللَّهُ فَلَن تَجِدَ لَهُۥ سَبِيلٗا ﴿٨٨﴾ وَدُّواْ لَوۡ تَكۡفُرُونَ كَمَا كَفَرُواْ فَتَكُونُونَ سَوَآءٗۖ فَلَا تَتَّخِذُواْ مِنۡهُمۡ أَوۡلِيَآءَ حَتَّىٰ يُهَاجِرُواْ فِي سَبِيلِ ٱللَّهِۚ فَإِن تَوَلَّوۡاْ فَخُذُوهُمۡ وَٱقۡتُلُوهُمۡ حَيۡثُ وَجَدتُّمُوهُمۡۖ وَلَا تَتَّخِذُواْ مِنۡهُمۡ وَلِيّٗا وَلَا نَصِيرًا ﴿٨٩﴾ إِلَّا ٱلَّذِينَ يَصِلُونَ إِلَىٰ قَوۡمِۭ بَيۡنَكُمۡ وَبَيۡنَهُم مِّيثَٰقٌ أَوۡ جَآءُوكُمۡ حَصِرَتۡ صُدُورُهُمۡ أَن يُقَٰتِلُوكُمۡ أَوۡ يُقَٰتِلُواْ قَوۡمَهُمۡۚ وَلَوۡ شَآءَ ٱللَّهُ لَسَلَّطَهُمۡ عَلَيۡكُمۡ فَلَقَٰتَلُوكُمۡۚ فَإِنِ ٱعۡتَزَلُوكُمۡ فَلَمۡ يُقَٰتِلُوكُمۡ وَأَلۡقَوۡاْ إِلَيۡكُمُ ٱلسَّلَمَ فَمَا جَعَلَ ٱللَّهُ لَكُمۡ عَلَيۡهِمۡ سَبِيلٗا ﴿٩٠﴾ سَتَجِدُونَ ءَاخَرِينَ يُرِيدُونَ أَن يَأۡمَنُوكُمۡ وَيَأۡمَنُواْ قَوۡمَهُمۡ كُلَّ مَا رُدُّوٓاْ إِلَى ٱلۡفِتۡنَةِ أُرۡكِسُواْ فِيهَاۚ فَإِن لَّمۡ يَعۡتَزِلُوكُمۡ وَيُلۡقُوٓاْ إِلَيۡكُمُ ٱلسَّلَمَ وَيَكُفُّوٓاْ أَيۡدِيَهُمۡ فَخُذُوهُمۡ وَٱقۡتُلُوهُمۡ حَيۡثُ ثَقِفۡتُمُوهُمۡۚ وَأُوْلَٰٓئِكُمۡ جَعَلۡنَا لَكُمۡ عَلَيۡهِمۡ سُلۡطَٰنٗا مُّبِينٗا ﴿٩١﴾﴾

---

[1] مسلم(١٧٠٧/٤).

[2] أبوداود(٣٧٨/٥) فەرموودەیەکی سەحیحە.

**نیگەرانی دەربڕین دەربارەی ناکۆکی هاوەڵەکان لەسەر گەڕانەوەی ئەوانەی کە لە ئوحودا گەڕانەوە**

خودای مەزن دەفەرمووێت: ﴿فَمَا لَكُمْ فِي الْمُنَافِقِينَ فِئَتَيْنِ﴾ ئێوە چیتانە دەربارەی ئەو دووڕووانە خۆتان کردووەتە دوو دەستە؟ خودای مەز لێرەدا ناڕەزایی دەردەبڕێت لەسەر ئەو مشتومڕەی خاوەن باوەڕان لە نێوان خۆیاندا دەربارەی دووڕووەکان دەیانکردو بووبوون بە دوو تاقمو هەر تاقمێك ڕای خۆی هەبوو جیاوازیەکەشیان لەسەر ئەوەبوو کە ئیمامی ئەحمەد ڕیوایەتی کردووە لە زەیدی کوڕی سابتەوە: کە پێغەمبەری خودا(ﷺ) دەرچوو بەرەو ئوحود(أُحد) کەسانێك کە لەوانەی کە لە گەڵیدابوون گەڕانەوە هاوەڵەکانی پێغەمبەر(ﷺ) دەربارەیان بوون بە دوو بەشەوە، هەندێکیان دەیانوت: دەبێت بیانکوژن، هەندێکی تریش دەیانوت: نابێت، ئیتر ئەم ئایەتە هاتەخوارەوە: ﴿فَمَا لَكُمْ فِي الْمُنَافِقِينَ فِئَتَيْنِ﴾. پێغەمبەری خودا(ﷺ) فەرمووی:(مەدینە(طیبة) یە پاکە وەکو موشەدەمە(کورەی ئاگر) چۆن خڵتەو ژەنگی ئاسن لادەبات، مەدینەش پیسی ئەوها لادەبات)[1] لە هەردوو سەحیحەکەد ئەم فەرموودەیە هاتووە[2] عەوفی لە ئیبنو عەباسەوە وتی: ئەم ئایەتە لەسەر کۆمەڵێك لە مەککە هاتووەتەخوارەوە کە بڕوایان هێنابوو، کەچی هاوکاری بت پەرستەکانیان دەکرد، دەرچوون لە مەککە بەشوێن پێویەکانی خۆیانداو وتیان: ئەگەر گەیشتن بە هاوەڵەکانی محمد(ﷺ) تووشی هیچ بەڵایەك نابین بەدەستیانەوە. کاتێك موسڵمانەکان هەواڵیان پێگەیشت کە ئەوانە لە مەککە دەرچوون، کۆمەڵێك لە موسڵمانەکان وتیان: بڕۆن بۆ ئەو ترسنۆکانە بیانکوژن، چونکە ئەوانە هاوکاری دوژمنەکەتان دەکەن بەرامبەر بە ئێوە. کۆمەڵێکی تر لە موسڵمانکان وتیان:(سبحان الله) ئایا ئێوە کۆمەڵێك دەکوژن ئەوەی ئێوە دەرتان بڕیوە(دانتان پێداناوە) ئەوانیش دەریانبڕیوەو وتویانە؟ واتە: ئەوانیش وەك ئێوە بڕوایان هێناوە، ئایا هەر لەبەرئەوە دەیانکوژنو ماڵیان تاڵان دەکەن کە کۆچیان نەکردووەو ماڵی خۆیان بەجێنەهێشتووە؟ بۆیە بوون بە دوو تاقم، پێغەمبەر(ﷺ) لەوێدا ڕێگری لە هیچ لایەکیان نەکرد بەهیچ شێوەیەك، خودای مەزن ئەم ئایەتەی ناردەخوارەوە: ﴿فَمَا لَكُمْ فِي الْمُنَافِقِينَ فِئَتَيْنِ﴾[3] ئیبنو ئەبی حاتەم ڕیوایەتی کردووە. پاشان خودای گەورە دەفەرمووێت: ﴿وَاللَّهُ أَرْكَسَهُم بِمَا كَسَبُوا﴾ لەبەر کارێك کردوویانە خودا ژێروژووری کردونەتەوەو(بە خودانەناسی داناون). واتە: گەڕاندنیەوەو تووشی هەڵەی کردوون بەهۆی کردەوەکانیانەوە. ئیبنو عەباس وتی: ﴿أَرْكَسَهُم﴾ واتە:

---

[1] أحمد(٤/١٨٤) فەرموودەیەکی سەحیحە.

[2] فتح الباری(٤/١١٥)، مسلم(٢/١٠٠٧).

[3] الطبری(٩/١٠).

تووشی کردوون.[1] ﴿بِمَا كَسَبُوٓاْ﴾ بەهۆی سەرپێچیو گوێڕایەڵ نەکردنی پێغەمبەرو(ﷺ) شوێن کەوتنی پڕوپوچەوە. ﴿أَتُرِيدُونَ أَن تَهْدُواْ مَنْ أَضَلَّ ٱللَّهُ ۖ وَمَن يُضْلِلِ ٱللَّهُ فَلَن تَجِدَ لَهُۥ سَبِيلًا﴾ ئایا ئێوە دەتانەوێت کەسێك خودا ڕێگەی لێ ون بکات، بیخەنەوە سەر ڕاستەڕێ؟ هەرکەسێك خودا ڕێگەی لێ ون بکات تۆ ناتوانیت ڕێگەیەکی بۆ پەیدا بکەیت. واتە: هیچ ڕێگەیەکی بۆنیە خۆی لێوە دەربازبکات تاکو خۆی بگەیەنێتە سەر ڕاستەڕێ. پاشان خودای مەزن دەفەرموێت: ﴿وَدُّواْ لَوْ تَكْفُرُونَ كَمَا كَفَرُواْ فَتَكُونُونَ سَوَآءً﴾ ئەم دووڕووانە(هەروەك خۆیان خودانەناسن) دەیانەوێت ئێوەش لە ئاینتان وەرگێڕن، ئەوسا وەکویەکتان لێ بێت. واتە: ئەوانەی دەیانەوێت ئێوەش گومڕابن هەتا وەکو ئەوانتان لێ بێت. ئەوەش لەبەرئەوەیە کە زۆر دوژمنتانن‌و زۆر ڕقیان لێتانە. هەربۆیە خودای گەورە دەفەرموێت: ﴿فَلَا تَتَّخِذُواْ مِنْهُمْ أَوْلِيَآءَ حَتَّىٰ يُهَاجِرُواْ فِى سَبِيلِ ٱللَّهِ ۚ فَإِن تَوَلَّوْاْ فَخُذُوهُمْ وَٱقْتُلُوهُمْ حَيْثُ وَجَدتُّمُوهُمْ ۖ وَلَا تَتَّخِذُواْ مِنْهُمْ وَلِيًّا وَلَا نَصِيرًا﴾ جا تاکو ئەوان کۆچ نەکەن‌و لەگەڵتان نەیەن بۆ غەزا، ئێوە دۆستایەتیان مەکەن. ئەگەر ئەم کارەشیان نەکردن، ئێوە لە هەر کوێ تووشیان بوون ڕێیان مەدەن هەڵبێن‌و بیانکوژن، لەگەڵ هیچ کەسێك لەوانە دۆستایەتیتان هەرنەبێت‌و یارویاوەر لە نێوانیاندا هەڵمەبژێرن. عەوفی لە ئیبنو عەباسەوە وتی: ﴿فَإِن تَوَلَّوْاْ﴾ واتە: ئەگەر کۆچیان نەکرد.[2] سوددی وتی: ئەگەر بێ دینی خۆیان ئاشکراکرد.

## ئەوەی شەڕدەکات‌و ئەوەی شەڕناکات

پاشان خودای گەورە کۆمەڵێکی لەوانە جیاکردووەتەوەو دەفەرموێت: ﴿إِلَّا ٱلَّذِينَ يَصِلُونَ إِلَىٰ قَوْمٍۭ بَيْنَكُمْ وَبَيْنَهُم مِّيثَٰقٌ﴾ مەگین ئەوانەی پەیمانیان لەگەڵ کەسانێکدا هەیە، کە ئەوانیش بوونەتە هاوپەیمانی ئێوە. واتە: مەگین ئەوانەی کە خۆیان داوەتە پاڵ کۆمەڵێك‌و یان لایەنگریانن کە لە نێوان ئێوەو ئەواندا ڕ~ێکەوتن هەیە. یان پەیمانێك هەیە، چیتان لەگەڵ ئەوانەدا کرد هەرواش لەگەڵ ئەماندا بکەن ئەمە قسەی سوددی‌و ئیبنو زەیدو ئیبنو جەریرە.[3] وە لە سەحیحی بوخاریدا هاتووە لە بەسەرهاتی ڕێکەوتنەکەی حودەبیەدا: بەوشێوەیەبوو هەرکەسێك پێی خۆشە بچێتە ناو ڕێکەوتنەکەی قورەیش‌و پەیمانی ئەوان با بڕواو هەرکەسێکیش پێی خۆشە بچێتە ناو ڕێکەوتنەکەی محمد(ﷺ)

---

[1] الطبري(٩/١٥).

[2] الطبري(٩/١٧).

[3] الطبري(٩/١٩).

هاوەڵەکانیو پەیمانی ئەوان با بڕوات. ڕیوایەت کراوە لە ئیبنو عەباسەوە کە وتویەتی: ئەم ئایەتە کە خودای گەورە دەفەرموویت: ﴿ فَإِذَا انسَلَخَ الْأَشْهُرُ الْحُرُمُ فَاقْتُلُوا الْمُشْرِكِينَ حَيْثُ وَجَدتُّمُوهُمْ ﴾[1] هەرکاتێك مانگە حەرامەکان بڕانەوە ئەو بت پەرستانەت لە هەرکوێیەك بەدەست کەوت لە کوشتنیان دەست مەپارێزە. ئەم ڕێکەوتنو پەیمانەی هەڵوەشاندووەتەوە(نەسخ کردووەتەوە) خودای گەورە دەفەرموویت: ﴿أَوْ جَاءُوكُمْ حَصِرَتْ صُدُورُهُمْ أَن يُقَاتِلُوكُمْ أَوْ يُقَاتِلُوا قَوْمَهُمْ ﴾ یان ئەوانەی لە ناچاری هاتوونەتەبەر دالدەی ئێوەو لەوناوەدا دوودڵ ماون کە بەگژ ئێوەدا بچن یان تووشی خزم کوشتن ببن. ئەمانە کۆمەڵێکی ترن کە نابێت شەڕیان لەگەڵدا بکرێت. چونکە دڵیان زۆر تەنگە پێیان خۆش نیە بچن بەگژتاندا، بەلاشیانەوە ئاسان نیە لەگەڵ ئێوەدا کەس‌وکاری خۆیان بکوژن. نە لەگەڵ ئێوەنو نە لەگەڵ ئەوانن ﴿ شَاءَ اللَّهُ لَسَلَّطَهُمْ عَلَيْكُمْ فَلَقَاتَلُوكُمْ ﴾ ئەگەر خودا مەیلی لێبووایە، ئەوەندە دەستەڵاتی پێ دەدان کە بەگژتاندا بچنو سەریش بکەون. واتە: لە سۆزو بەزەیی خوداوەیە کە لایداون لێتان ﴿فَإِنِ اعْتَزَلُوكُمْ فَلَمْ يُقَاتِلُوكُمْ وَأَلْقَوْا إِلَيْكُمُ السَّلَمَ فَمَا جَعَلَ اللَّهُ لَكُمْ عَلَيْهِمْ سَبِيلًا ﴾ ئەگەر خۆیان لە ئێوە دوورخستەوەو بەگژتاندا نەهاتوون، دەیانەوێت شەڕیان لەناودا نەمێنێت. خودا ڕێگەی پێنەداون کە ئێوە دەستیان بۆ بەرن. واتە: لەبەرئەوە ئەوانە وابیردەکەنەوەو نایانەوێت کە شەڕ لە دژی ئێوەو خزمەکانیشیان بکەنو ئێوەش بۆتان نیە بیانکوژن، وەك ئەو کۆمەڵەی لە نەوەی بەنی هاشم لە ڕۆژی بەدردا لەگەڵ بت پەرستەکان دەرچوون، ئامادەی شەڕکەبوون بە ناچاری هاتبوون وەك عەبباسو چەند کەسێکی تر، هەربۆیە پێغەمبەر(ﷺ) ڕێگەی نەدا لەوکاتەدا عەبباس بکوژنو فەرمانی دەست بەسەرکردنیدا، پاشان خودای گەورە دەفەرموویت: ﴿سَتَجِدُونَ آخَرِينَ يُرِيدُونَ أَن يَأْمَنُوكُمْ وَيَأْمَنُوا قَوْمَهُمْ﴾ لەگەڵ گرۆیەکی تریشدا ئێوە ڕووبەڕوودەبنەوە، دەیانەوێت هەم لە ئێوەو خزمو کەس‌وکاریان بێ ترسبن. ئەمانە لە ڕواڵەتدا وەك ئەو کۆمەڵەی پێشەوەوان. بەڵام نیەتی ئەمانە وەك ئەوان نیەو جیاوازە. چونکە ئەمانە کۆمەڵێکی دووڕوون، بە ڕواڵەت ئسلامەتی خۆیان نیشانداوە بۆ پێغەمبەرو(ﷺ) هاوەڵەکانی، بۆئەوەی ترسیان لە خۆیانوماڵو منداڵو سامانیان نەبێتو بیپارێن. لە ژێریشەوە هاوکاری خودانەناسەکان دەکەنو ئەوشتانەی بت پەرستەکان دەیپەرستن ئەوانیش دەیپەرستن لەگەڵیان. بۆئەوەی ترسیان لەونیش نەمێنێت، بەڵام لە دڵداو لە ژێرەوە هەر لەگەڵیانن. وەك خودای گەورە دەفەرموویت: ﴿وَإِذَا خَلَوْا إِلَىٰ شَيَاطِينِهِمْ قَالُوا إِنَّا مَعَكُمْ ﴾[2] هرکاتێك چوونەلای

---

[1] التوبة(٥).

[2] البقرة(١٤).

شەیتانەکانی خۆیان دەڵێن: ئێمە لەگەڵ ئێوەین. خودای گەورە لێرەدا دەفەرمووێت: ﴿كُلَّ مَا رُدُّوٓاْ إِلَى ٱلْفِتْنَةِ أُرْكِسُواْ فِيهَا﴾ هەرکاتێك بانگکران بێ سێ و دوو کردن دەچنەوە ناو خزمەکانیان بۆ بت پەرستی. سوددی وتی: مەبەست لە ﴿ٱلْفِتْنَةِ﴾ لێرەدا شیرکە[1] واتە: دەچنەوە ناو بت پەرستەکان و دەست دەکەنەوە بە بت پەرستی. ئیبنو جەریر ڕیوایەتی کردووە لە موجاهدەوە کە ئەم ئایەتە لەسەر کۆمەڵێك لە خەڵکی مەککە هاتووەتەخوارەوە کە هاتن بۆلای پێغەمبەر(ﷺ) بە ڕووپامایی موسڵمان دەبن و پاشان دەگەڕێنەوە بۆناو قورەیشیەکان دەست دەکەنەوە بە بت پەرستی. بۆئەوەی لەلای موسڵمانەکان و لەلای قورەیشیەکانیش بێ ترسبن. خودای گەورە فەرمانیدا کە بیانکوژن ئەگەر وازیان لەوکارەیان نەهێناو خۆیان چاك نەکردو پەشیمان نەبوونەوە.[2] بۆیە خودای مەزن دەفەرمووێت: ﴿فَإِن لَّمْ يَعْتَزِلُوكُمْ وَيُلْقُوٓاْ إِلَيْكُمُ ٱلسَّلَمَ﴾ جا ئەگەر ئەوانە لێتان نەتەکنەوە و کەناگیرنەبن دەست لە بەدفەڕی هەڵنەگرن و بەرامبەرتان ئاشتی ڕانەگەیەنن ﴿وَيَكُفُّوٓاْ أَيْدِيَهُمْ فَخُذُوهُمْ وَٱقْتُلُوهُمْ حَيْثُ ثَقِفْتُمُوهُمْ وَأُوْلَٰٓئِكُمْ جَعَلْنَا لَكُمْ عَلَيْهِمْ سُلْطَٰنًا مُّبِينًا﴾ لە هەرکوێیەك بەگیرتان هێنان بیانکوژن و مەهێڵن لەدەستان رابکەن، ئەوا ئێمە لەسەر ئەوان دەستەڵاتی تەواومان داوە بە ئێوە.

﴿وَمَا كَانَ لِمُؤْمِنٍ أَن يَقْتُلَ مُؤْمِنًا إِلَّا خَطَـًٔا ۚ وَمَن قَتَلَ مُؤْمِنًا خَطَـًٔا فَتَحْرِيرُ رَقَبَةٍ مُّؤْمِنَةٍ وَدِيَةٌ مُّسَلَّمَةٌ إِلَىٰٓ أَهْلِهِۦٓ إِلَّآ أَن يَصَّدَّقُواْ ۚ فَإِن كَانَ مِن قَوْمٍ عَدُوٍّ لَّكُمْ وَهُوَ مُؤْمِنٌ فَتَحْرِيرُ رَقَبَةٍ مُّؤْمِنَةٍ ۖ وَإِن كَانَ مِن قَوْمٍۭ بَيْنَكُمْ وَبَيْنَهُم مِّيثَٰقٌ فَدِيَةٌ مُّسَلَّمَةٌ إِلَىٰٓ أَهْلِهِۦ وَتَحْرِيرُ رَقَبَةٍ مُّؤْمِنَةٍ ۖ فَمَن لَّمْ يَجِدْ فَصِيَامُ شَهْرَيْنِ مُتَتَابِعَيْنِ تَوْبَةً مِّنَ ٱللَّهِ ۗ وَكَانَ ٱللَّهُ عَلِيمًا حَكِيمًا ﴿٩٢﴾ وَمَن يَقْتُلْ مُؤْمِنًا مُّتَعَمِّدًا فَجَزَآؤُهُۥ جَهَنَّمُ خَٰلِدًا فِيهَا وَغَضِبَ ٱللَّهُ عَلَيْهِ وَلَعَنَهُۥ وَأَعَدَّ لَهُۥ عَذَابًا عَظِيمًا ﴿٩٣﴾﴾

## بڕیاری کوشتنی خاوەن باوەڕ بە هەڵە

خودای مەزن دەفەرمووێت: ﴿وَمَا كَانَ لِمُؤْمِنٍ أَن يَقْتُلَ مُؤْمِنًا إِلَّا خَطَـًٔا﴾ هیچ باوەڕدارێك بۆی نیە باوەڕدارێکی تر بکوژێت، مەگین بە هەڵە. بەهەر شێوەیەك بێت. وەك لە هەردوو سەحیحەکەدا هاتووە لە ئیبنو مەسعودەوە کە پێغەمبەری خودا(ﷺ) فەرموویەتی:(حەڵاڵ نیە خوێنی هیچ

---

[1] الطبری(٩/٢٨).

[2] الطبری(٩/٢٧).

کەسێکی موسڵمان کە شایەتی بدات بەوەی کە هیچ کەسێك شایەنی پەرستن نیە جگە لە خوداو منیش پێغەمبەری خودام مەگەر بە یەکێك لەم سیانە: پیاوی ژنهاوەر ژنی مێرکردوو کە زینا بکەن، وە گیان بە گیان(کەسێك کەسێك بە ناهەقی بکوژێتو لە تۆڵەیدا دەکوژرێتەوە)، وە کەسێك پاشگەزببێتەوە لە ئاینی خۆیی‌و لە کۆمەڵی موسڵمانان جیاببێتەوە[1] ئەگەر یەکێك لەم سیانە ڕوویدا هیچ کەسێك لە موسڵمانان بۆی نیە بیانکوژێت، تەنیا پێشەواو جێگرەکەی بۆیان هەیە بیانکوژن. ﴿إِلَّا خَطَـًٔا﴾ مەگین بە هەڵە. زانایان وتویانە ئەمە ئیستسنای مونقەتیعە(استثناء منقطع)، ڕای جیاواز هەیە لەسەر هاتنەخوارەوەی ئەم ئایەتە. موجاهدو کەسانی تریش وتویانە: لەسەر عەییاشی کوڕی ڕەبیعە کە برای ئەبوجەهلە لە دایکیەوە، کە ئەسمائی کچی موخەڕەبە(اسماء بنت مخرب) ئەوەبوو پیاوێکی کوشت کە خۆیی‌و براکەی سزایان دابوو لەسەرئەوەی کە موسڵمان بووە، کە ناوی حاریسی کوڕی یەزیدی کوڕی عامیری بوو. عەییاش ئەوەی لە دڵدا بۆهەڵگرتبوو. ئەو پیاوە موسڵمان بوو کۆچیشی کرد، بەڵام عەییاش ئاگاداری ئەوە نەبوو، لە ڕۆژی فەتحی مەککەدا چاوی پێکەوت، وایزانی کە هەر موشریکەو پەلاماریداو کوشتی، خودای گەورە ئەم ئایەتەی ناردەخوارەوە[2] عەبدڕەحمانی کوڕی زەیدی کوڕی ئەسلەم وتی: ئەم ئایەتە لەسەر ئەبو دەرداء هاتووەتەخوارەوە کە پیاوێکی کوشت شایەتومانی هێنابوو، کاتێك کە شمشێرەکەی لێ بەرزکردەوە، پەلاماری دابوو شایەتومانی هێنبوو، ئەوەیان باسکرد بۆ پێغەمبەر(ﷺ) ئەبودەرداء وتی: بۆ خۆپارێزی وتی: پێغەمبەر(ﷺ) فەرمووی:(دەی تۆ ناو دڵی ئەوت لەت کردبوو)[3] ئەم بەسەرهاتە لە فەرموودەیەکی(الصحیح لغیر) ی ئەبودەرداء هاتووە.

خودای گەورە دەفەرموویێت: ﴿وَمَن قَتَلَ مُؤۡمِنًا خَطَـًٔا فَتَحۡرِيرُ رَقَبَةٖ مُّؤۡمِنَةٖ وَدِيَةٞ مُّسَلَّمَةٌ إِلَىٰٓ أَهۡلِهِۦٓ﴾ هەرکەسێك باوەڕدارەو باوەڕدارێك لە دەستی بە هەڵە کوژراوە، دەبێت لەبری ئەو کوشتنە کۆیلەیەکی خاوەن باوەڕ ئازاد بکاتو نرخی خوێنەکەشی بدات بە کەس‌وکرەکەی. ئەم دووانە پێویستە لە کوشتنی هەڵەدا. یەکەم: کەفارەتدانی ئەو تاوانە گەورەیە با بە هەڵەش بێت. مەرجەکەشی ئازادکردنی کۆیلەیەکی خاوەن باوەڕە، کۆیلەی بێ باوەڕ جێی ناگرێتەوە. ئیمامی ئەحمەد ڕیوایەتی کردووە لە پیاوێکی ئەنسارییەوە کە کەنیزەیەکی ڕەش پێستی هێناوە بۆلای پێغەمبەر(ﷺ) وتی: ئەی پێغەمبەری خودا من لسەرمە کۆیلەیەکی خاوەن باوەڕ ئازاد بکەم، ئەگەر تۆ ئەمە بە باوەڕدار دەزانیت ئەوا ئازادم کرد، پێغەمبەر(ﷺ) بە کەنیزەکەی فەرموو:(ئایا شایەتی دەدەی کە هیچ پەرستراوێك نیە

---

[1] فح الباري(١٢/٢٠٩)، مسلم(٣/١٣٠٢).

[2] الطبري(٩/٣٢).

[3] الطبري(٩/٣٤).

جگە لە خودا؟) وتی: بەڵێ، فەرمووی:(ئایا شایەتی دەدەی کە من پێغەمبەری خودام(ﷺ)؟)وتی: بەڵێ، فەرمووی:(ئایا بڕوات بە زیندووبوونەوە هەیە دوای مردن؟) وتی: بەڵێ، فەرمووی:(ئازادی بکە)[1] ئەم فەرموودەیە سەندەکانی ڕاستن. ﴿وَدِيَةٌ مُّسَلَّمَةٌ إِلَىٰٓ أَهۡلِهِۦٓ﴾ نرخی خوێنەکەش بدات. ئەمە ئەرکی دووهەمە، کە لە نێوان پیاکوژەکەو کەس‌وکاری کوژراوەکەدایە لەباتی ئەوکەسەی کە لە دەستیان چووە. ئەم نرخی خوێنباییەش مەرجە لە پێنج جۆری وشتردا بێت. وەك ئیمامی ئەحمەدو خاوەن فەرموودەکانی تر ڕیوایەتیان کردووە لە ئیبنو مەسعودەوە وتی: پێغەمبەری خودا(ﷺ)

بڕیاریدا لە نرخی خوێنی کوشتنی هەڵەدا بە بیست(بنت مخاض) وە بیت(بنی مخاض) ی نێرە. وە بیست(جذعة) وە بیست(حقة) ئەم وتەیە هی نەسائیە[2] ئەم نرخی خوێنەش لەسەر کەس‌وکاری پیاوکوژکەیە، نەك لە ماڵی پیاوکوژەکە خۆی. وەك لە هەردوو سەحیحەکەدا هاتووە ئەبوهورەیرە وتی: دوو ژن شەڕیان کرد لە هۆزی هوزەیل، یەکێکیان بەردێکی دا بەوی تریان ژنەکەو ئەو کۆرپەلەیەی کە لە سکیداوو کوشتی، کێشەکەیان هێنایەلای پێغەمبەری خودا(ﷺ) بڕیاریدا بۆ خوێنی کۆرپەلەکە بەندەیەك یان کەنیزەیەك بدات، وە بڕیاریشیدا کە نرخی خوێنی ژنەکە لەسەر کەس‌وکاری ئەو ژنەیە کە ژنەکەی تری کوشتووە.[3] ئەمە ئەوە دەگەیەنێت کە کوشتنێك لە شێوەی ئەنقەست بێت(شبه العمد) بڕیاری(حوکمی) هەر بڕیاری کوشتنی هەڵەی هەیە لە نرخی خوێنەکەیدا، بەڵام نرخی ئەم شێوە ئەنقەستە(شبه العمد) لە سێ جۆری وشتردا دەبێت. وەك چۆن لە کوشتنی ئەنقەستدا(العمد) سێ جۆر وشترە. وە لە سەحیحی موسلیمدا هاتووە لە عەبدوڵڵای کوڕی عومەرەوە وتی: پێغەمبەری خودا(ﷺ) خالیدی کوڕی وەلیدی نارد بۆلای بەنی جەزیمە(بنی جذيمة) بانگی کردن بۆ ئیسلام، بەڵام ئەوان نەیاندەزانی بڵێن: موسڵمان بووین، هەر دەیانوت:(صبأنا صبأنا)، خالیدیش دەستی کرد بە کوشتنیانەو هەواڵە گەیشتە پێغەمبەری خودا(ﷺ) هەردوو دەستی بەرزکردەوەو فەرمووی:(ئەی خودایە بێتاوانی خۆم دەردەبڕم بۆ تۆ لەوەی کە خالید کردوویەتی) عەلی ناردو نرخی خوێنەکەیانی داو هەر ماڵێکیشیان فەوتابوو بۆی بژاردن هەتا ئەو دەفرەی کە سەگیش ئاوی تێدا خواردبووەوە[4] ئەم فەرموودەیە ئەوەی لێ وەردەگیرێت کە ئیمامو جێگرەکەی کە لە گەنجینەی دەوڵەت(بيت المال) دەدرێت. خودای مەزن دەفەرموێت: ﴿إِلَّآ أَن يَصَّدَّقُواْ﴾ مەگین پیاوەتی بکەن‌و پێی بەخشن،

---

[1] أحمد(٣/٤٥١) فەرموودەیەکی سەحیحە.

[2] النسائي(٤٧٩٩)، أحمد(١/٣٨٤)، أبوداود(٤٥٤٥)، الترمذي(١٣٨٦)، ابن ماجه(٢٦٣١) فەرموودەیەکی مەوقوفە.

[3] فتح الباری(١٢/٢٦٣)، مسلم(٣/١٣٠٩).

[4] فتح الباری(٧/٦٥٣).

ئەگینا دەبێت نرخی خوێنێك بدات بە کەس‌وکارەکی ﴿فَإِن كَانَ مِن قَوْمٍ عَدُوٍّ لَّكُمْ وَهُوَ مُؤْمِنٌ فَتَحْرِيرُ رَقَبَةٍ مُّؤْمِنَةٍ﴾ ئەگەر کوژراوەکە باوەڕدارەو سەر بە هۆزی دوژمنانە، ئەوەی بە دەستی کوژراوە لەسەریەتی کۆیلەیەکی باوەڕدار ئازاد بکات(نرخی خوێنی نیە). ﴿وَإِن كَانَ مِن قَوْمٍ بَيْنَكُمْ وَبَيْنَهُم مِّيثَاقٌ فَدِيَةٌ مُّسَلَّمَةٌ إِلَىٰ أَهْلِهِ وَتَحْرِيرُ رَقَبَةٍ مُّؤْمِنَةٍ﴾ ئەگەر کوژراوەکە لە هۆزە خودانەناسن‌و لەگەڵ ئێوە پەیمانیان هەیە، دەبێت نرخی خوێنەکەی بدرێت‌و بەندەیەکی باوەڕداریش ئازاد بکات. ﴿فَمَن لَّمْ يَجِدْ فَصِيَامُ شَهْرَيْنِ مُتَتَابِعَيْنِ﴾ ئەوەی ئەوکارەی لەدەست قەوماوەو ناتوانێت بەندە ئازاد بکات لەسەریەتی دوو مانگی ڕەبەق لەسەریەك بەڕۆژو بێت. ئەگر بەبێ بەهانەی نەخۆشی‌و خوێنی سوڕی مانگانەو خوێنی پاش منداڵبوون ڕۆژوەکەی شکاند دەبێت دیسان دەست پێبکاتەوە دوو مانگی تر بەردەوام بەڕۆژوبێت. ﴿تَوْبَةً مِّنَ اللَّهِ وَكَانَ اللَّهُ عَلِيمًا حَكِيمًا﴾ هەتا خودا پەشیمانی لێ قبوڵ بکات، خودا زانای لەکارزانە. ئەمە تەوبەی ئەوکەسەیە کە بە هەڵە کەسێك دەکوژێت‌و کۆیلەی نەبوو بیدات دەبێت دوو مانگ لەسەریەك بەڕۆژوبێت بێ بچڕان.

## هەڕەشە لەسەر کوشتنی ئەنقەست

دوای ئەوەی خودای مەزن بڕیاری کوشتنی هەڵەی ڕوونکردەوە دێتەسەر ڕوونکردنەوەی بڕیاری کوشتنی ئەنقەست‌و دەفەرموێت: ﴿وَمَن يَقْتُلْ مُؤْمِنًا مُّتَعَمِّدًا فَجَزَاؤُهُ جَهَنَّمُ خَالِدًا فِيهَا وَغَضِبَ اللَّهُ عَلَيْهِ وَلَعَنَهُ وَأَعَدَّ لَهُ عَذَابًا عَظِيمًا﴾ هەرکەسێك بە ئەنقەست خاوەن باوەڕێك بکوژێت، لەبری ئەوە هەتاهەتایە لەناو جەهەننەمدایەو خودا غەزەبی لێگرتووەو بەرنەفرینی خستووەو ئازارێکی دژواری بۆداناوە. ئەمە بەڵێن‌و هەڕەشەیەکی زۆر توندە لەلایەن خوداوە بۆئەوکەسانەی کە ئەم تاوانە گەورەیە دەکەن‌و خەڵکی بە ئەنقەست دەکوژن لە ئایەتی تردا خودا ئەم تاوانەی لەگەڵ هاوەڵدانان بۆ خودا باسکردووە، وەك لە سورەتی(الفرقان) دا دەفەرموێت: ﴿وَالَّذِينَ لَا يَدْعُونَ مَعَ اللَّهِ إِلَٰهًا آخَرَ وَلَا يَقْتُلُونَ النَّفْسَ الَّتِي حَرَّمَ اللَّهُ إِلَّا بِالْحَقِّ﴾[1] ئەوکەسانەی لەگەڵ خودا، هیچ شتێکی تر ناپەرستن‌و کەسێکیش ناکوژن کە خودا ڕشتنی خوێنی قەدغەکردووە، مەگین بەهەق. وە لە ئایەتێکی تردا دەفەرموێت: ﴿قُلْ تَعَالَوْا أَتْلُ مَا حَرَّمَ رَبُّكُمْ عَلَيْكُمْ أَلَّا تُشْرِكُوا بِهِ شَيْئًا وَبِالْوَالِدَيْنِ إِحْسَانًا

[1] الفرقان(٦٨).

﴿ وَلَا تَقْتُلُوٓا۟ أَوْلَـٰدَكُم مِّنْ إِمْلَـٰقٍ ﴾[1] بلێ: وەرن ئەوشتانەی پەروەردگارتان لێی قەغەکردوون من بۆتان بخوێنمەوە کە هیچ شتێك بە شەریکی خودا مەزانن، لەگەڵ دایكوباوکی خۆتان چاکە بکەن‌و لە ترسی لەبرسامردن فەرزەندی خۆتان مەکوژن. ئایەت‌و فەرموودە لەبارەی قەدەغەکردنی کوشتنەوە زۆرە، لەو فەرموودانەی کە لە هەردوو سەحیحەکەدا هاتووە لە ئیبنو مەسعودەوە وتی: پێغەمبەری خودا(ﷺ) فەرموویەتی:(یەکەم شتێك لە ڕۆژی قیامەتدا دادوەری لەسەر دەکرێت لە نێوان خەڵکدا خوێنەکانە)[2] وە لە فەرموودەیەکی تردا کە ئەبوداود ڕیوایەتی کردووە لە عوبادەی کوڕی سامیتەوە کە وتی: پێغەمبەری خودا(ﷺ) فەرموویەتی:(بەردەوام خاوەن باوەڕ گەردنی بەرزەو چاکە هەتا تووشی خوێنی حەرام نەبێت، کاتێك تووشی خوێنی حەرام بوو هیچ خێروبێرێکی بۆنیە)[3] وە لە فەرموودەیەکی تردا پێغەمبەری خودا(ﷺ) فەرموویەتی: (لەناچوونی دونیا لەلای خودا ئاسنترە لە کوشتنی پیاوێکی موسڵمان)[4].

### ئایا پیاوێك بە ئەنقەست کەسێك بکوژێت تەوبەی لێ قبوڵ دەکرێت؟

ئیبنو عەبباس پێیوایە کە کوشتنی بە ئەنقەست تەوبەکردنی بۆنیە. بوخاریش ڕیوایەتی کردووە لە ئیبنو جەریرەوە وتی: ئەهلی کوفە ناکۆکیان هەبوو لەسەر کوشتنی بە ئەنقەست چوون بۆلای ئیبنو عەبباس پرسیاریان لێکرد لەوبارەیەوە وتی ئەم ئایەتە: ﴿ وَمَن يَقْتُلْ مُؤْمِنًا مُّتَعَمِّدًا فَجَزَآؤُهُۥ جَهَنَّمُ ﴾ دوایین ئایەتە هاتووەتەخوارەوە، هیچ شتێك نەسخی ناکاتەوە.[5] موسلیم‌و نەسائیش هەروا ڕیوایەتیان کردووە[6] بەڵام ئەوەی کە کۆی زانایانی پێشینەو پاشینەی لەسەرئەوەیە کە ئەو پیاوکوژە بۆی هەیە لە نێوان خۆی‌و خودای خۆی تەوبە بکات‌و ئەگەر تەوبەی کردوو بەچاکی گەڕایەوە بۆلای خوداو، بووە پیاوێکی لەخوداترس‌و ملکەچ‌و خەریکی کاری چاکەکردن بوو، خودا خراپەکانی بۆدەگۆڕێت بەچاکەو خودا لەباتی ئەوە پاداشتی کوژراوەکە دەداتەوەو ڕازی دەکات‌و داواکەی بۆجێبەجێ دەکات. خودای گەورە دەفەرمووێت: ﴿وَٱلَّذِينَ لَا يَدْعُونَ مَعَ ٱللَّهِ إِلَـٰهًا ءَاخَرَ﴾ هەتا دەگاتە ﴿إِلَّا مَن تَابَ وَءَامَنَ وَعَمِلَ عَمَلًا صَـٰلِحًا﴾ ئەمە خەبەرەو نەسخ کردنەوەی دروست نیەو ناشکرێت

---

[1] الانعام(١٥١).

[2] فتح الباري(١١/٤٠٢)، مسلم(٣/١٣٠٤).

[3] جامع المسانيد والسنن(٧/١٤٣) فەرموودەیەکی مەرفوعە.

[4] تحفة الاحوذي(٤/٦٥٢) فەرموودەیەکی مەوقوفە.

[5] فتح الباري(٨/١٠٦).

[6] مسلم(٤/٢٣١٨)، النسائي في الكبرى(٦/٣٢٦).

بۆ بت پەرست بەکاربهێنرێت. بەکارهێنانیشی بۆ خاوەن باوەڕان ناکۆکە لەگەڵ زامیرداو بەکارهێنانی پێویستی بە بەڵگە هەیە. پاشان خودای گەورە دەفەرمووێت: ﴿قُلْ يَا عِبَادِيَ الَّذِينَ أَسْرَفُوا عَلَىٰ أَنفُسِهِمْ لَا تَقْنَطُوا مِن رَّحْمَةِ اللَّهِ﴾[1] بلێ: ئەی بەندەکانی من، ئەی ئەوانەی کە بەلادان لە ئەندازە، ناهەقیتان لە خۆتان کردووە، نابێت ئێوە لە بەزەیی خودا بێ هیوابن. ئەم ئایەتە گشتگیرە بۆ هەموو گوناهێك لە خودانەناسیو بت پەرستیو گومانو دووڕوویيو کوشتنو لادانانو هەرشتێکی تر. هەرکەسێك تەوبەی کرد لە هەریەکێك لەمانە خودا تەوبەکەی لێ قبوڵ دەکاتوەك خودای گەورە لە ئایەتێکی تردا دەفەرمووێت: ﴿إِنَّ اللَّهَ لَا يَغْفِرُ أَن يُشْرَكَ بِهِ وَيَغْفِرُ مَا دُونَ ذَٰلِكَ لِمَن يَشَاءُ﴾[2] خودا ەوانە خۆشنابێت کە شەریکی بۆ دادەنێن، جگە لەوە لە هەرکەسێك خۆی مەیلی لێ بێت خۆشدەبێت. ئەم ئایەتە هەموو گوناهێك دەگرێتەوە جگە لە هاوبەشی دانان بۆ خودا. کە لەسەرەتای ئەم ئایەتەو لە دوایشیەوە لەم سورەتەدا باسکراوە، بۆئەوەی بێ ئومێدی ڕوونەکاتە بەندەکانو هەمیشە بەهیوای بەزەیی خودا بێت والله أعلم. هەردوو سەحیحەکەدا هەواڵی ئەو جوولەکەیە هاتووە کە سەد کەسی کوشت پاشان پرسیاری لە زانایەك کردو پێی وت: ئایا بۆ هەیە تەوبە بکەم؟ ئەویش پێی وت: کێ دەبێتە ڕێگر لە نێوات تۆو تەوبەکردندا؟ پاشان ڕێنمایی کرد بۆ وڵاتێك کە بچێت خوداناسی تێدابکات، کۆچی کرد بۆ ئەو وڵاتەو لە ڕێگەدا مردو فریشتەی بەزەیی(الرحمة) گیانی کێشا[3] وەك چەندجار باسمان کردووە. ئەگەر ئەمە لە نەوەی ئیسرائیل بووە، خۆ لەم ئوممەتەدا دەبێت باشترو چاکتر تەوبە قبوڵ ببێت، چونکە خودای مەزن ئەو کۆتو گرێیانەی لەسەر ئەوان بووە لەسەر ئێمەی لابردووەو پێغەمبەرێکی بەم ئاینە فراوانو لێ بووردەوە بۆ ناردووین. بەڵام ئەوئایەتە پیرۆزەی کە خودای مەزن دەفەرمووێت: ﴿وَمَن يَقْتُلْ مُؤْمِنًا مُّتَعَمِّدًا﴾ هەرکەسێك خاوەن باوەڕێك بە ئەنقەست بکوژێت. ئەبوهورەیرەو کۆمەڵێك زانایانی پێشینە(السلف) وتویانە: ئەو تۆڵەکەیەتی ئەگەر تۆڵەکەی لێ بسێنێت، هەموو هەڕەشەیەکیش لەسەر گوناه هەر بەوشێوەیەیە. بەڵام لەسەر قسەی ئیبنو عەبباسو ئەوانەی هاوڕایەتی ئەوکەسە تەوبەی بۆنیە، یان لەسەر قسەی کۆی زانایان لە کاتێکدا کە کردەوەی چاکی نەبووە پێی ڕزگاری ببێت، ئەوە هەتا هەتایی لەناو ئاگر نامێنێتەوە، بەڵکو مەبەست بە هەتا هەتایی مانەوەی زۆرە، فەرموودەی زۆر ڕیوایەت کراوە لە پێغەمبەری خودا(ﷺ) لەوانە ئەم فەرموودیەیە

---

[1] الزمر(٥٣).

[2] النساء(١١٦).

[3] فتح الباري(٦/٥٩١)، مسلم(٤/٢١١٨).

کە:(فەرموویەتی لەناو ئاگر دێتەدەرەوە هەرکەسێك بە ئەندازەی کەمترینی گەردیلەیەك باوەڕ لە دڵیدابێت)[1].

﴿ يَٰٓأَيُّهَا ٱلَّذِينَ ءَامَنُوٓاْ إِذَا ضَرَبۡتُمۡ فِي سَبِيلِ ٱللَّهِ فَتَبَيَّنُواْ وَلَا تَقُولُواْ لِمَنۡ أَلۡقَىٰٓ إِلَيۡكُمُ ٱلسَّلَٰمَ لَسۡتَ مُؤۡمِنٗا تَبۡتَغُونَ عَرَضَ ٱلۡحَيَوٰةِ ٱلدُّنۡيَا فَعِندَ ٱللَّهِ مَغَانِمُ كَثِيرَةٞۚ كَذَٰلِكَ كُنتُم مِّن قَبۡلُ فَمَنَّ ٱللَّهُ عَلَيۡكُمۡ فَتَبَيَّنُوٓاْۚ إِنَّ ٱللَّهَ كَانَ بِمَا تَعۡمَلُونَ خَبِيرٗا ﴿٩٤﴾ ﴾

**ئاشتی یەکێکە لە نیشانەکان ئیسلام**

ئیمامی ئەحمەد ڕیوایەتی کردووە لە عیکرەمەوە لە ئیبنو عەبباسەوە وتی: پیاوێك لە بەنی سولەیم تێپەڕی بەلای کۆمەڵێك لە هاوەڵەکانی پێغەمبەردا(ﷺ) مەڕماڵاتی خۆی دەلەوەڕاند، سڵاوی لێکردن‌و وتیان: بۆیە سڵاوی لێکردوین هەتا خۆیمان لێ بپارێزێت، پەلاماریانداو کوشتیان پاشان مەڕەکانیان هێنا بۆلای پێغەمبەر(ﷺ) ئەم ئایەتە هاتەخوارەوە: ﴿ يَٰٓأَيُّهَا ٱلَّذِينَ ءَامَنُوٓاْ ﴾[2] هەتا کۆتایی ئایەتەکە. تیرمیزیش لە تەفسیرەکەیدا باسی کردووەو پاشان وتی: ئەم فەرموودەیە حەسەنە. وە هەر لەم بەشەدا(الباب) لە ئوسامەی کوڕی زەیدیشەوە ڕیوایەت کراوە[3] حاکمیش ڕیوایەتی کردووە پاشان وتی: سەنەدەکەی چاکە. بەڵام بوخری‌و موسلیم نەیان هێناوە[4] بوخاری ڕیوایەتی کردووە لە ئیبنو عەبباسەوە لەم ئایەتەدا ﴿وَلَا تَقُولُواْ لِمَنۡ أَلۡقَىٰٓ إِلَيۡكُمُ ٱلسَّلَٰمَ لَسۡتَ مُؤۡمِنٗا﴾ وتی: ئیبنو عەبباس وتی: پیاوێك بەلای مەڕەکانیەوە بووە، موسڵمانەکان پێی گەیشتوون ئەویش وتویەتی:(السلام علیکم)، کوشتوویانەو مەڕەکانیشیان بردووە. خودای مەزن ئەم ئایەتەی لەسەر ئەوە ناردووەتەخوارەوە ﴿وَلَا تَقُولُواْ لِمَنۡ أَلۡقَىٰٓ إِلَيۡكُمُ ٱلسَّلَٰمَ لَسۡتَ مُؤۡمِنٗا﴾. ئیبنو عەباس وتی:(عرض الدنیا) واتە: ئەو تاڵانیە. ئیبنوعەبباس بە(السلام) ی خوێندووەتەوە.[5] ئیمامی ئەحمەد ڕیوایەتی کردووە لە قەعقاعی(القعقاع) کوڕی عەبدوڵای کوڕی ئەبی حەدرەدەوە(حدرد) لە باوکیەوە و (عەبدوڵای کوڕی ئەبی حەدرەدەوە) وتی: پێغەمبەری خودا(ﷺ) ناردمی بۆ(اضم) منیش لەگەڵ کۆمەڵێك موسڵماندا دەرچووم کە ئەبو قەتادەو حاریسی کوڕی ڕەببعی‌و موحەلیمی کوڕی

---

[1] البخاری(٤٤/٧٥٠٩)، الترمذی(٢٥٩٨).

[2] أحمد(٢٧٢/١) فەرموودەیەکی حەسەنە.

[3] تحفة الاحوذي(٣٨٦/٨) فەرموودەیەکی حەسەنە.

[4] الحاکم(٢٣٥/٢) فەرموودەیەکی حەسەنە.

[5] فتح الباری(١٠٧/٨).

جەسامەی(محلم بن جثامة) کوڕی قەیسی تێدابوو، ڕۆیشتین هەتا چووینە(بطن اضم) عامیری کوڕی(الاضبت الاشجعی) بەلاماندا تێپەڕی بەسەر وشترێکی نێرینەوە هەندێك پێداویستی خۆی پێ بوو لەگەڵ دەفرێك شیردا، کە بەلاماندا ڕۆیشت سڵاوی کرد، ئێمەش وازمان لێ هێنا، بەڵام موحەلیمی کوڕی جەسامەی پەلاماریداو کوشتی کە لەبەرشتێك لە نێوانیان ڕیدابوو. وشترو ئەوشتانەی پێی بوو بردی بۆخۆی، کاتێك کە گەیشتینەوە لای پێغەمبەری خودا(ﷺ) دەنگوباسەکەمان بۆگێڕایەوەو ئەم ئایەتەی قورئان لەسەرمان هاتەخوارەوە کە خودای گەورە دەفەرموێت: ﴿ يَـٰٓأَيُّهَا ٱلَّذِينَ ءَامَنُوٓاْ إِذَا ضَرَبْتُمْ فِى سَبِيلِ ٱللَّهِ فَتَبَيَّنُواْ وَلَا تَقُولُواْ لِمَنْ أَلْقَىٰٓ إِلَيْكُمُ ٱلسَّلَـٰمَ لَسْتَ مُؤْمِنًا تَبْتَغُونَ عَرَضَ ٱلْحَيَوٰةِ ٱلدُّنْيَا فَعِندَ ٱللَّهِ مَغَانِمُ كَثِيرَةٌ ۚ كَذَٰلِكَ كُنتُم مِّن قَبْلُ فَمَنَّ ٱللَّهُ عَلَيْكُمْ فَتَبَيَّنُوٓاْ ۚ إِنَّ ٱللَّهَ كَانَ بِمَا تَعْمَلُونَ خَبِيرًا ﴾ تەنیا ئیمامی ئەحمەد خۆی هێناویەتی[1] بوخاری ڕیوایەتی کردووە لە ئیبنو عەبباسەوە، وتی: پێغەمبەری خودا(ﷺ) فەرمووی بە میقداد: (کاتێك پیاوێکی خاوەن باوەڕ، بڕوای خۆی شاردەوە لەگەڵ هۆزە خودانەناسەکەیدا ك بڕاوی خۆی ئاشکراکرد، تۆ کوشتت، خۆ تۆش هەر بەوشێوەیە بڕوای خۆت شاردەوە لە مەککە لە پێشدا) بوخاری بەم شێوەیە باسی کردووە بە کورتی‌و موعەلەقی،[2] بەڵام بەدرێژی‌و مەوسولیش(موصولا) ڕیوایەت کراوە. حافیز ئەبوبەکری بەزار ڕیوایەتی کردووە لە ئیبنو عەبباسەوە، وتی: پێغەمبەری خودا(ﷺ) سریەیەکی نارد میقدادی کوڕی ئەسوەدیشی تێدابوو، کاتێك کە گەیشتنە ئەو کۆمەڵە دیتیان بڵاوەیان کردووە، تەنیا پیاوێك کە ماڵ‌و سامانێکی زۆری هەبوو نەڕۆیشتبوو، وتی: شایەتی دەدەم کە هیچ پەرستراوێك نیە جگە لە خودا، میقداد پەلاماریداو کوشتی، پیاوێك لە هاوەڵەکانی پێی وت: ئایا تۆ پیاوێکت کوشت کە شایەتی دا کە پەرستراوێك نیە جگە لە خودا؟ سوێند بە خودا ئەمە دەگێڕمەوە بۆ پێغەمبەر(ﷺ). کاتێك کە هاتنەوە بۆلای پێغەمبەری خودا(ﷺ) پێیان وت: ئەی پێغەمبەری خودا(ﷺ) پیاوێك شایەتی دا کە هیچ پەرستراوێك نیە جگە لە خودا، میقداد کوشتی، فەرمووی:(میقدادم بۆ بانگ بکەن، ئەی میقداد ئایا پیاوێکت کوشت کە دەیوت:(لا اله الا الله) ئەی بەیانی چی دەکەی بەرامبەر(لا اله الا الله)؟) وتی: خودای گەورە ئەم ئایەتەی ناردەخوارەوە ﴿ يَـٰٓأَيُّهَا ٱلَّذِينَ ءَامَنُوٓاْ إِذَا ضَرَبْتُمْ فِى سَبِيلِ ٱللَّهِ فَتَبَيَّنُواْ وَلَا تَقُولُواْ لِمَنْ أَلْقَىٰٓ إِلَيْكُمُ ٱلسَّلَـٰمَ لَسْتَ مُؤْمِنًا تَبْتَغُونَ عَرَضَ ٱلْحَيَوٰةِ ٱلدُّنْيَا فَعِندَ ٱللَّهِ مَغَانِمُ كَثِيرَةٌ ۚ كَذَٰلِكَ كُنتُم مِّن قَبْلُ فَمَنَّ ٱللَّهُ عَلَيْكُمْ فَتَبَيَّنُوٓاْ ۚ إِنَّ ٱللَّهَ كَانَ

---

[1] أحمد(٦/١١) پیاوەکانی جێی متمانەن.

[2] البخاری(٦٨٦٦).

بِمَا تَعْمَلُونَ خَبِيرًا ﴾ پێغەمبەری خودا بە میقدادی فەرموو:(کاتێك کە پیاوێکی خاوەن باوەڕ، بڕوای خۆی شاردەوە لەگەڵ هۆزە خودانەناسەکەیدا، کە بڕوای خۆی ئاشکراکرد تۆ کوشتت، خۆ تۆش هەر بەوشێوەیە بڕوای خۆشت شاردەوە لە مەککەدا لە پێشدا)[1] پاشان خودای گەورە دەفەرموێت: ﴿فَعِندَ ٱللَّهِ مَغَانِمُ كَثِيرَةٌ﴾ دەستکەوتی زۆرە وا لەلای خودا. واتە: ئەوەی لەلای خودایە زۆر چاکترە لەوشتانەی لە دونیا بەدەستی دێنن‌و واتان لێدەکات کە ئەوکەسە بکوژن سڵاوتان لێدەکات‌و بڕوای خۆیتان بۆ ئاشکرا دەکات‌و ئێوە گوێی پێنادەن‌و تاوانباری دەکەن بەوەی کە لە ترسا شایەتومانی هێناوە بۆ دەستکەوتێکی کەمی ژیانی دونیا. ئەوەی لەلای خودایە لە ڕۆزی حەڵاڵ زۆر باشترە بۆتان لەو ماڵە ﴿كَذَٰلِكَ كُنتُم مِّن قَبْلُ فَمَنَّ ٱللَّهُ عَلَيْكُمْ﴾ ئێوەش لەپێشدا هەروا بوون‌و باوەڕتان بە خودا نەبوو، خودا ئێوەی خستەبەر بەزەیی خۆی. ئێوەش بڕواکەتان دەشاردەوە، وەك ئەوکەسەی کە لە هۆزەکەی شاردبووەوە، وەك لە فەرموودە مەرفوعەکەدا لە پێشەوە باسکرا. وەك خودای گەورە دەفەرموێت: ﴿وَٱذْكُرُوٓاْ إِذْ أَنتُمْ قَلِيلٌ مُّسْتَضْعَفُونَ فِى ٱلْأَرْضِ﴾[2] بیر لەوکاتە بکەنەوە کە ئێوە لەم وڵاتەدا کەمێکی بێ دەستەڵات بوون. عەبدوڕەزاق ڕیوایەتی کردووە لە سەعیدی کوڕی جوبەیرەوە لەم ئایەتەدا: ﴿كَذَٰلِكَ كُنتُم مِّن قَبْلُ﴾ وتی: ئێوەش هەروا بڕواکەتان شاردبووەوە[3] ﴿فَتَبَيَّنُوٓاْ﴾ بەچاکی لە کاری خۆتان وردببنەوە، ئەمە جەخت کردنەوەیە لەسەر پێشی خۆی ﴿فَتَبَيَّنُوٓاْ إِنَّ ٱللَّهَ كَانَ بِمَا تَعْمَلُونَ خَبِيرًا﴾ خودا لە هەرکارێك دەیکەن ئاگادارە. سەعیدی کوڕی جوبەیر وتی: ئەمە هەڕەشەیەکی توندە.

﴿لَّا يَسْتَوِى ٱلْقَٰعِدُونَ مِنَ ٱلْمُؤْمِنِينَ غَيْرُ أُوْلِى ٱلضَّرَرِ وَٱلْمُجَٰهِدُونَ فِى سَبِيلِ ٱللَّهِ بِأَمْوَٰلِهِمْ وَأَنفُسِهِمْ ۚ فَضَّلَ ٱللَّهُ ٱلْمُجَٰهِدِينَ بِأَمْوَٰلِهِمْ وَأَنفُسِهِمْ عَلَى ٱلْقَٰعِدِينَ دَرَجَةً ۚ وَكُلًّا وَعَدَ ٱللَّهُ ٱلْحُسْنَىٰ ۚ وَفَضَّلَ ٱللَّهُ ٱلْمُجَٰهِدِينَ عَلَى ٱلْقَٰعِدِينَ أَجْرًا عَظِيمًا ﴿٩٥﴾ دَرَجَٰتٍ مِّنْهُ وَمَغْفِرَةً وَرَحْمَةً ۚ وَكَانَ ٱللَّهُ غَفُورًا رَّحِيمًا ﴿٩٦﴾﴾

## ئەوانەی لە ماڵی خۆیان دانیشتوون لەگەڵ ئەوانەی دەچنە غەزا وەکویەك نین

خودای مەزن دەفەرموێت: ﴿لَّا يَسْتَوِى ٱلْقَٰعِدُونَ مِنَ ٱلْمُؤْمِنِينَ غَيْرُ أُوْلِى ٱلضَّرَرِ وَٱلْمُجَٰهِدُونَ فِى سَبِيلِ ٱللَّهِ بِأَمْوَٰلِهِمْ وَأَنفُسِهِمْ ۚ فَضَّلَ ٱللَّهُ ٱلْمُجَٰهِدِينَ بِأَمْوَٰلِهِمْ وَأَنفُسِهِمْ عَلَى ٱلْقَٰعِدِينَ دَرَجَةً ۚ وَكُلًّا وَعَدَ ٱللَّهُ ٱلْحُسْنَىٰ ۚ وَفَضَّلَ ٱللَّهُ

---

[1] مجمع الزوائد(٩/٧) سەنەدەکانی باشە(جید).

[2] الانفال(٢٦).

[3] عبدالرزاق(١٧٠/١).

ﭐلْمُجَٰهِدِينَ عَلَى ٱلْقَٰعِدِينَ أَجْرًا عَظِيمًا﴾ ئەو بڕوادارانەی هەر لە ماڵی خۆیان دەمێنن (جیا لەوانەی نوقستانن) لەگەڵ ئەوانەی دەچنە غەزاو لە ڕێ خوداو ماڵو گیانیان لە ڕێی خودا بەخت دەکەن، وەکویەك نین. خودا غەزاکردنی بەرامبەر ئەوانەی لە ماڵ دانیشتوون بە پلەیەك سەرخستووە. خودا بەڵێنی بە هەموو لایەکیانداوە کە چاکەیان لەگەڵ دەکاتن بەڵام ئەوانەی لە مەیدانی غەزادا بن، لەچاو ئەوانەی لە ماڵ دانیشتوون پاداشتێکی زۆر گەورەیان دەداتێ. بوخاری ڕیوایەتی کردووە لە بەڕائەوە وتی: کاتێك ئەم ئایەتە هاتەخوارەوە ﴿لَّا يَسْتَوِي ٱلْقَٰعِدُونَ مِنَ ٱلْمُؤْمِنِينَ﴾ پێغەمبەری خودا(ﷺ) زەیدی بانگ کرد نووسی. ئیبنو ئوموەکتوم هاتو باسی نوقستانی خۆی کرد خودای گەورە ئەمەی ناردەخوارەوە ﴿غَيْرُ أُوْلِي ٱلضَّرَرِ﴾[1] جگە لەوانەی کە نوقستانن. دیسان بوخاری ڕیوایەتی کردووە لە سەهلی کوڕی سعدی ساعیدیەوە کە مەروانی کوڕی حەکەمی بینی لە مزگەوتدا، وتی: ڕۆیشتم هەتا لە تەنیشتی دانیشتم، هەواڵی داینێ کە زەیدی کوڕی سابت پێی وتووە پێغەمبەری خودا(ﷺ)ئەم ئایەتەی بۆخوێندمەوە: ﴿لَّا يَسْتَوِي ٱلْقَٰعِدُونَ مِنَ ٱلْمُؤْمِنِينَ غَيْرُ أُوْلِي ٱلضَّرَرِ وَٱلْمُجَٰهِدُونَ فِي سَبِيلِ ٱللَّهِ﴾ لەوکاتەدا ئیبنو مەکتوم هات پێغەمبەر(ﷺ) بۆی دەخوێندمەوە. وتی: ئەی پێغەمبەری خودا(ﷺ) سوێند بە خودا ئەگەر توانام ببوایە بۆ غەزا، غەزام دەکرد، چونکە نابینابوو، ئەوەندە ڕانی قورس بوو لەسەرم ترسام کە ڕانم بشکێت. پاشان نیگاکەی لەسەرم نەما خودای گەورە ئەمەی ناردەخوارەوە: ﴿غَيْرُ أُوْلِي ٱلضَّرَرِ﴾[2] تەنها بوخاری خۆی هێناویێتی. تیرمیزیش ڕیوایەتی کردووە لە ئیبنو عەبباسەوە لەم ئایەتەدا ﴿لَّا يَسْتَوِي ٱلْقَٰعِدُونَ مِنَ ٱلْمُؤْمِنِينَ غَيْرُ أُوْلِي ٱلضَّرَرِ﴾ وتی: لەسەر بەدرو لەوانەی دەرچوون بۆ بەدر هاتووەتەخوارەوە. کاتێك کە غەزای بەدر هاتەپێشەوە عەبدوڵای کوڕی جەحشو ئیبنو ئوموەکتوم(کە هەردووکیان نابینابوون) وتیان ئەی پێغەمبەری خودا(ﷺ) ئێمە نابینابین ئایا ئێمە دەرفەتمان هەیە؟ ئەم ئایەتە هاتەخوارەوە ﴿لَّا يَسْتَوِي ٱلْقَٰعِدُونَ مِنَ ٱلْمُؤْمِنِينَ غَيْرُ أُوْلِي ٱلضَّرَرِ﴾ خودا ڕێزی ئەوانەی داوە کەغەزادەکەن بەسەر ئەوانەدا کە دانیشتوون جگە لەوانەی کە نوقستانو کەم ئەندامن ﴿وَفَضَّلَ ٱللَّهُ ٱلْمُجَٰهِدِينَ عَلَى ٱلْقَٰعِدِينَ أَجْرًا عَظِيمًا﴾ وە دەفەرمووێت: ﴿دَرَجَٰتٖ مِّنْهُ﴾ پلەوپایەیەکی زۆر گەورەی لەلایەن خۆیەوە داوە بەوانەی کە جیهادیان کردووە بەسەر ئەوانەدا کە لە ماڵەوە ماونەتەوە لە بڕواداران جگە لەوانەی کە نوقستانن. ئەم وتەیە، وتەی تیرمیزیە، پاشان وتی: ئەم

---

[1] فتح الباری(٨/٣٨٨).

[2] فتح الباری(٨/١٠٨).

فەرموودەیە حەسەن‌و غەریبە.[1] خودای مەزن فەرموویەتی: ﴿لَّا يَسْتَوِي الْقَاعِدُونَ مِنَ الْمُؤْمِنِينَ﴾ بە کشتیری بووە. کاتێك بە نیگای پەلە ﴿غَيْرُ أُولِي الضَّرَرِ﴾ هاتەخوارەوە، ئەمە بوو بە دەروازەیەك کە بیانووی ڕەوایان هەبێت بۆ نەچوون بۆ غەزا وەك نابینایی‌و نوقستانی‌و نەخۆشی، کە وەك ئەوانەی ماڵ‌و گیان بەخت دەکەن پاداشت وەربگرن. وەك لە سەحیحی بوخاریدا هاتووە لە ئەنەسەوە، وتی: کە پێغەمبەری خودا(ﷺ) فەرموویەتی:(لەڕاستیدا لە مەدینەدا کەسانێك هەن کە هەر غزاغێك ڕۆیشتبن‌و هەر شیوودۆڵێکتان بڕیبێت ئەوانە لەگەڵتان دەبوون تێیدا). وتیان: ئەی پێغەمبەری خودا(ﷺ) ئەوانەن کە لە مەدینەن؟ فەرمووی:(بەڵێ، بەهانە(العزر) گلی داونەتەوە)[2] خودای مەزن دەفەرموێت: ﴿وَكُلًّا وَعَدَ اللَّهُ الْحُسْنَىٰ﴾ خودا بەڵێنی بە هەموویان داوە کە چاکەیان لەگەڵ دەکات. واتە: بە بەهەشت‌و پاداشتی زۆرباش. ئەم بەڵگەیەش لەسەرئەوە کە غەزاکردن فەرزی عەین نیە، بەڵکو فەرزی کیفایەتە، واتە: لەسەر هەموو کەسێك فەرزنیە ئەگەر کۆمەڵێك هەستان بە غەزاکردن، لەسەر شانی ئەوی تری دەکەوێت. پاشان خودای مەزن دەفەرموێت: ﴿وَفَضَّلَ اللَّهُ الْمُجَاهِدِينَ عَلَى الْقَاعِدِينَ أَجْرًا عَظِيمًا﴾ بەڵام ئەوانەی لە مەیدانی غەزادان لەچاو ئەوانەی لە ماڵەوە دانیشتوون پاداشتێکی هەرەگەورەیان دەداتێ. لە کۆشکە گەورەکانی ناو بەهەشت‌و لەگەڵ لێخۆشبوونی گوناهو ئەو هەڵانەی کردوویانەو بەزەیی‌و سۆزو چاکەی خۆش دەبارێنێت بەسەریاندا بە ڕێزو کەرەمی خۆی، هەربۆیە دەفەرموێت: ﴿دَرَجَاتٍ مِّنْهُ وَمَغْفِرَةً وَرَحْمَةً ۚ وَكَانَ اللَّهُ غَفُورًا رَّحِيمًا﴾ پلەوپایەیەکی ئێجگار زۆر(لەلایەن خوداوە) لەگەڵ لێخۆشبوون‌و میهرەبانی، خودا بەخشندەو دلۆڤانە. لە هەردوو سەحیحەکەدا هاتووە لە ئەبوسەعیدی خودەریەوە کە پێغەمبەری خودا(ﷺ) فەرموویەتی:(لەناو بەهەشتدا سەد پلە هەیە خودا دایناوە بۆ ئەوانەی لە ڕێی ئەودا غەزا دەکەن، نێوان هەر دوو پلە(لەو پلانە) وەك نێوانی ئاسمان‌و زەمینە)[3].

﴿إِنَّ الَّذِينَ تَوَفَّاهُمُ الْمَلَائِكَةُ ظَالِمِي أَنفُسِهِمْ قَالُوا فِيمَ كُنتُمْ ۖ قَالُوا كُنَّا مُسْتَضْعَفِينَ فِي الْأَرْضِ ۚ قَالُوا أَلَمْ تَكُنْ أَرْضُ اللَّهِ وَاسِعَةً فَتُهَاجِرُوا فِيهَا ۚ فَأُولَٰئِكَ مَأْوَاهُمْ جَهَنَّمُ ۖ وَسَاءَتْ مَصِيرًا ﴿٩٧﴾ إِلَّا الْمُسْتَضْعَفِينَ مِنَ الرِّجَالِ وَالنِّسَاءِ وَالْوِلْدَانِ لَا يَسْتَطِيعُونَ حِيلَةً وَلَا يَهْتَدُونَ سَبِيلًا ﴿٩٨﴾ فَأُولَٰئِكَ عَسَى اللَّهُ أَن يَعْفُوَ عَنْهُمْ ۚ وَكَانَ اللَّهُ عَفُوًّا غَفُورًا ﴿٩٩﴾ ۞ وَمَن

---

[1] تحفة الاحوذي(٣٨٨/٨) حەسەنی غەریبە.

[2] فتح الباری(٧٣٢/٧).

[3] مسلم(١٥٠١/٣).

يُهَاجِرْ فِي سَبِيلِ ٱللَّهِ يَجِدْ فِي ٱلْأَرْضِ مُرَٰغَمًا كَثِيرًا وَسَعَةً ۚ وَمَن يَخْرُجْ مِنۢ بَيْتِهِۦ مُهَاجِرًا إِلَى ٱللَّهِ وَرَسُولِهِۦ ثُمَّ يُدْرِكْهُ ٱلْمَوْتُ فَقَدْ وَقَعَ أَجْرُهُۥ عَلَى ٱللَّهِ ۗ وَكَانَ ٱللَّهُ غَفُورًا رَّحِيمًا ﴿١٠٠﴾

## قەدەغەكردنی مانەوە لە نێوان بت پەرستەكاندا بۆ ئەوكەسانەی توانای كۆچكردنیان هەیە

خودای مەزن دەفەرمووێت: ﴿إِنَّ ٱلَّذِينَ تَوَفَّىٰهُمُ ٱلْمَلَٰٓئِكَةُ ظَالِمِىٓ أَنفُسِهِمْ﴾ ئەوكەسانەی هەر لە جێی خۆیان ماونەتەوەو غەدریان لە خۆیان كرد، كە فریشتە گیانیان دەكێشن، بوخاری ڕیوایەتی كردووە لە موحەممەدی كوڕی عەبدوڕەحمانی ئەبی ئەسوەدەوە، وتی: فەرزكرا لەسەر خەڵكی مەدینە كە لەشكرێك ڕەوانە بكات، منیش یەكێك بووم لەوانە كە دەبوو بڕۆیشتمایە، گەیشتم بە عیكرمەی مەولای ئیبنو عەبباس‌و هەواڵی ئەوەم پێدا، زۆر بە توندی پێی وتم كە نەچم، پاشان وتی: ئیبنو عەبباس بۆی باسكردووم كە كۆمەڵێك لە موسڵمانەكان كە لەگەڵ موشریكەكاندابوون‌و ژمارەی موشریكەكانیان زۆردەكرد لە زەمانی پێغەمبەری خودا(ﷺ) تیرێك دەهاوێژرێت‌و دێت بەری یەكێكیان دەكەوێت‌و دەیكوژێت، یان لێی دەدرێت‌و دكوژرێت، ئەم ئایەتە دێتەخوارەوە كە خودای گەورە دەفەرمووێت: ﴿إِنَّ ٱلَّذِينَ تَوَفَّىٰهُمُ ٱلْمَلَٰٓئِكَةُ ظَالِمِىٓ أَنفُسِهِمْ﴾[1] زەحاك وتی: ئەم ئایەتە لەسەر كۆمەڵێك لە دووڕووەكان هاتووەتەخوارەوە، كە لە پێغەمبەری خودا(ﷺ) دواكەوتن لە مەككە، لە ڕۆژی بەدردا لەگەڵ بت پەرستەكان دەرچوون، هەندێك لەوانە تووشی بوون(واتە: كوژران یان دیل كران) ئەم ئایەتە پیرۆزە هاتەخوارەوە.[2] ئەم ئایەتە گشتگیرە، هەموو كەسێك دەگرێتەوە كە لەناو بت پەرستەكاندا بمێنێتەوەو توانای كۆچكردنی هەبێت. نەتوانێت بە پێی پەیڕەوی ئاینی ئیسلام هەڵس‌وكەوت بكات، ئەوە ناهەقی لە خۆی دەكات‌و خۆی تووشی گوناه دەكات بەڕای هەموو زانایان‌و بە دەقی ئەم ئایەتە كە خودای گەورە دەفەرمووێت: ﴿إِنَّ ٱلَّذِينَ تَوَفَّىٰهُمُ ٱلْمَلَٰٓئِكَةُ ظَالِمِىٓ أَنفُسِهِمْ﴾ كە كۆچ ناكەن ﴿قَالُوا۟ فِيمَ كُنتُمْ﴾ پێیان دەڵێن: ئێوە لەكوێ بوون؟ واتە: بۆچی ئا لەوێ مانەوەو كۆچتان نەكرد. ﴿قَالُوا۟ كُنَّا مُسْتَضْعَفِينَ فِى ٱلْأَرْضِ﴾ دەڵێن: ئێمە زەمیندا چەوساوەو بێ دەستەڵات بووین. واتە: نەمان دەتوانی لەو وڵاتە دەربچین‌و بڕۆین بۆ شوێنێكی تر ﴿قَالُوٓا۟ أَلَمْ تَكُنْ أَرْضُ ٱللَّهِ وَٰسِعَةً فَتُهَاجِرُوا۟ فِيهَا ۚ فَأُو۟لَٰٓئِكَ مَأْوَىٰهُمْ جَهَنَّمُ ۖ وَسَآءَتْ مَصِيرًا﴾ پێیان دەڵێن: مەگەر سەرزەمینی خودا والانەبوو تا لە زێدی خۆتان كۆچ بكەن‌و بڕۆنە جێگایەكی تر؟ ئەمانە جەهەننەم جێگەیانەو دواڕۆژێكی خراپیان هەیە. ئەبوداود ڕیوایەتی كردووە لە

---

[1] فتح الباری(١١١/٨).

[2] الطبری(١٠٨/٩).

سەمورەی کوڕی جوندەبەوە وتی: پێغەمبەری خودا(ﷺ) فەرموویەتی:(هەرکەسێك لەگەڵ بت پەرستدا کۆببێتەوەو لەگەڵی دابنیشێت، ئەویش وەکو ئەو وایە).[1] ﴿إِلَّا ٱلۡمُسۡتَضۡعَفِينَ مِنَ ٱلرِّجَالِ وَٱلنِّسَآءِ وَٱلۡوِلۡدَٰنِ لَا يَسۡتَطِيعُونَ حِيلَةٗ وَلَا يَهۡتَدُونَ سَبِيلٗا﴾ جا مەگین ئەو پیاوو ژنو مندالە قێزلێکراوانەی(چەوساوانەی) هیچ دەرەتانێکیان نەبوویێتو شارەزای ڕێگەیەکیش نەبن. ئەم ئایەتە بەڵگەو بەهانەیە بۆ ئەوانەی کە کۆچیان نەکردووە، لەبەرئەوە نەیان توانیوە خۆیان لەدەست بت پەرستان ڕزگاربکەن، ئەگەر بیانتوانیایەو شارەزای ڕێگابوونایە کۆچیان دەکرد. هەربۆیە خودای گەورە دەفەرمووێت: ﴿لَا يَسۡتَطِيعُونَ حِيلَةٗ وَلَا يَهۡتَدُونَ سَبِيلٗا﴾ موجاهدو عیکرەمەو سوددی وتیان: ئەوانەی شارەزای ڕێگە نین.[2] پاشان خودای مەزن دەفەرمووێت: ﴿فَأُوْلَٰٓئِكَ عَسَى ٱللَّهُ أَن يَعۡفُوَ عَنۡهُمۡ﴾ هیچ دوورنیە خودا ئەمانە ببەخشێت. واتە: خودا چاوپۆشی لەوانە دەکات کە کۆچیان نەکردووە. ﴿عَسَى﴾ لەلایەن خوداوە بۆ چاوپۆشی کردنەز واتە: لێیان دەبوورێت. ﴿وَكَانَ ٱللَّهُ عَفُوًّا غَفُورٗا﴾ خودا هەمیشە چاوپۆشی لێکەرو لێبوردەیە. بوخاری ڕیوایەتی کردووە لە ئەبوهورەیرەوە وتی: پێغەمبەری خودا نوێژی عیشای بۆکردین کاتێك فەرمووی:(سمع الله لمن حمده) پاشان پێش ئەوەی سوجدە ببات فەرمووی:(خودایە وەلیدی کوڕی وەلیدو سەلەمەی کوڕی هیشامو عەییاشی کوڕی ڕەبیعەو ئەوانەی بێ دەستەڵاتن لە باوەڕداران ڕزگاریان بکەیت، خودایە زەحمەتی زۆر بدەی بەسەر موزەڕدا(مُضر) تووشی گرانیان بکە وەك گرانیو قاتوقڕیەکەی زەمانی یوسف)[3] بوخاری وتی: ئەبونوعمان بۆی باسکردین، حەممادی کوڕی زەید بۆیگێڕاینەوە لە ئەییەوە، لە ئیبنو ئەبی مولەیکەوە، لە ئیبنو عەبباسەوە وتی: منو دایکم لەوکەسانە بووین کە خودای گەورە بەهانەی لێ قبوڵ کردین[4] پاشان خودای گەورە دەفەرمووێت: ﴿وَمَن يُهَاجِرۡ فِي سَبِيلِ ٱللَّهِ يَجِدۡ فِي ٱلۡأَرۡضِ مُرَٰغَمٗا كَثِيرٗا وَسَعَةٗ﴾ هەرکەسێك لە ڕێی خودا لە ماڵی خودا دەربچێتو کۆچ بکات، لەم سەرزەمینە زۆر شوێنی حەوانەوەو ئاسودەیی دەست دەکەوێت. ئەمە خۆی هاندانە بۆکۆچکردنو هەڵنانە بۆ جیابوونەوە لە بت پەرستان. بێگومان بڕوادار هەرکاتێك لە زێدی خۆی دەرچوبێت خودا دەروی لێ کردووەتەوە، شوێنێکی دەستکەوتووە خۆی تێدا بپارێزێت،

---

[1] أبوداود(٣/٢٢٤) سەنەدەکانی حەسەنە.

[2] الطبری(٩/١١١).

[3] فتح الباری(٨/١١٣).

[4] فتح الباری(٨/١١٣).

ئیبنو عەبباس وتی:(المراغم) واتە: دەرچوون لە زەمینێکەوە بۆ زەمینێکی تر[1] هەر بەوشێوەیەش ڕیوایەت کراوە لە زەحاكو ڕەبیعی کوڕی ئەنەسو سەوریەوە[2] موجاهید ﴿مُرَٰغَمٗا كَثِيرٗا﴾ لەوشوێنەی کە پێی ناخۆشە دەترازێت(ڕزگاری دەبێت). ﴿وَسَعَةٗ﴾ واتە: ڕۆزی، قەتادەو کەسانی تریش وتویانە لەم دەقەدا ﴿يَجِدۡ فِي ٱلۡأَرۡضِ مُرَٰغَمٗا كَثِيرٗا وَسَعَةٗ﴾ واتە: سوێند بە خودا لە گومڕایی‌و هەژاری ڕزگاری دەبێتبۆ ڕێی ڕاستو دەوڵەمەندی[3] پاشان خودای گەورە دەفەرموێت: ﴿وَمَن يَخۡرُجۡ مِنۢ بَيۡتِهِۦ مُهَاجِرًا إِلَى ٱللَّهِ وَرَسُولِهِۦ ثُمَّ يُدۡرِكۡهُ ٱلۡمَوۡتُ فَقَدۡ وَقَعَ أَجۡرُهُۥ عَلَى ٱللَّهِۗ وَكَانَ ٱللَّهُ غَفُورٗا رَّحِيمٗا﴾ هەرکەسێك لە زێدی خۆی دەربچێتو لە ڕێی خوداو پێغەمبەری خودادا دەربەدەر بووبێتو لە ئاوارەییدا بمرێت، خودا بۆخۆی دەستەبەری پاداشتیەتی‌و خودا لە گوناهی دەبورێتو دلۆڤانە. واتە: هەرکەسێك کۆچ بکاتو لە ماڵی خۆی دەربچێت لەوکاتەدا لە ڕێگەدا بمرێت، ئەوە لەلای خودا پاداشتی ئەو کۆچکردنەی بۆدەنوسرێت، وەك لە هەردووسەحیحەکەدا هاتووەو لە سەحیحەکانی ترداو لە موسنەدو سونەنەکانی تریشدا هەر هاتووە لە عومەری کوڕی خەتابەوە وتی: پێغەمبەری خودا(ﷺ) فەرموویەتی:(کاروکردەوەکان هەر بە پێی نیەتن‌و هەرکەسێك بە پێی نیەتی خۆی، هەرکەسێك کۆچەکەی بۆلای خوداو پێغەمبەری خودا بێت، ئەوە کۆچەکەی بۆلای خوداو پێغەمبەری خودایە، هەرکەسێکیش کۆچەکەی بۆ(ماڵێکی) دونیابێت بەدەستی بهێنێت، یان ژنێك بێت کە مارەی بکات ئەوە کۆچەکەی بۆ ئەوەیە کە کۆچی بۆکردووە)[4] ئەم فەرموودەیە گشتگیرە بۆ کۆچکردن‌و هەموو کردارێك، وە ئەم فەرموودەیەش کە لە هەردوو سەحیحەکەدا هاتووە لەبارەی پیاوێکەوە کە نەوەدو نۆ کەسی کوشتووەو پاشان بە خوداناسەکەوە کردوویەتی بە سەد کەس، پاشان پرسیار لە زانایەك دەکات، ئایا بۆی هەیە تەوبە بکات؟ ئەویش پێی دەڵێت: کێ ڕیگرە لە نێوان تۆو لە نێوان تەوبەکردندا؟ پاشان ڕێنمایی دەکات کە لە وڵاتەکەی خۆیەوە بچێت بۆ وڵاتێکی ترو لەوێدا خوداپەرستی خۆی بکات، کاتێك لە وڵاتەکەی خۆی دەرچوو کۆچی دوایی کرد بۆ ئەو وڵاتەی تر لە ڕێگەدا مردن یەخەی پێگرت، فریشتەکانی بەزەیی‌و فریشتەکانی سزادان بووە مشت‌ومڕ لەسەریان، ئەوان دەیانوت تەوبەی کردووەو هاتووە، ئەمانیش دەیانوت: هێشتا نەگەیشتووە، فەرماندرا کە نێوانی ئەو دوو زەویە بپێون، بۆلای هەرکامیان نزیکتربوو، ئەو بۆ

---

[1] الطبري(١١٩/٨).

[2] الطبري(١٢٠/١١٩/٨).

[3] الطبري(١٢١/٩).

[4] فتح الباري(١٦٤/١)، مسلم(١٥١٥/٣)، أبوداود(٦٥١/٢)، تحفة الاحوذي(٢٨٣/٥)، النسائي(٧١٣/٧)، ابن ماجه(١٤١٣/٢)، أحمد(٢٥/١).

ئەویانەیە، خودای مەزن فەرمانیدا کە لە کامیان نزیك ببێتەوەو لەویان دوور بکەوێتەوە، بینیان بوەستێت لەو زەویەی کە کۆچی بۆکردووە نزیکترە، فریشتەکانی بەزەیی وەریانگرت. وە لە ڕیوایەتێکی تردا هاتووە: کاتێك کە مردن یەخەی گرت بە سنگی خۆی نزیك خستەوە بەرەو ئەو زەویەی کە کۆچی بۆکرد[1].

﴿وَإِذَا ضَرَبْتُمْ فِي الْأَرْضِ فَلَيْسَ عَلَيْكُمْ جُنَاحٌ أَنْ تَقْصُرُوا مِنَ الصَّلَاةِ إِنْ خِفْتُمْ أَنْ يَفْتِنَكُمُ الَّذِينَ كَفَرُوا ۚ إِنَّ الْكَافِرِينَ كَانُوا لَكُمْ عَدُوًّا مُبِينًا ﴿١٠١﴾﴾

## نوێژی کورتکراوە

خودای مەزن دەفەرموویت: ﴿وَإِذَا ضَرَبْتُمْ فِي الْأَرْضِ﴾ ئەگەر چوونە سەفەر(لە ولاتدا) وەك خودای مەزن لە ئایەتێکی تردا دەفەرموویت: ﴿عَلِمَ أَنْ سَيَكُونُ مِنْكُمْ مَرْضَىٰ ۙ وَآخَرُونَ يَضْرِبُونَ فِي الْأَرْضِ يَبْتَغُونَ مِنْ فَضْلِ اللَّهِ ۙ وَآخَرُونَ يُقَاتِلُونَ فِي سَبِيلِ اللَّهِ﴾[2] خودا دەزانێت هەندێکتان نەخۆش دەکەوێت‌و هەندێکیشتان بۆ بژێویە کە خودا بیدات، بە ولاتدا بلاودەبنەوە. وە دەفەرموویت: ﴿فَلَيْسَ عَلَيْكُمْ جُنَاحٌ أَنْ تَقْصُرُوا مِنَ الصَّلَاةِ﴾ هیچ گوناهێکتان ناگات نوێژەکانتان کورت بکەنەوە. واتە: نوێژە چوار ڕکاتیەکان بکەن بە دوو ڕکات، بەلام ئەم دەقە کە خودای گەورە دەفەرموویت: ﴿إِنْ خِفْتُمْ أَنْ يَفْتِنَكُمُ الَّذِينَ كَفَرُوا﴾ ئەگەر ترسان لەوەی کە خودانەناسان تووشی بەلایەکتان بکەن. لەکاتی هاتنەخوارەوەی ئەم ئایەتەدا زۆربەی سەفەرەکان جێی ترس بوو لە سەرەتای هاتنی ئاینی ئیسلامەوەو لە دوای کۆچ کردنیشەوە، بەلکو هیچ سەفەرێکمان نەدەکرد مەگین ئەو سەفەرە بۆ غەزایەکی گەورە بووە یان بۆ ناردنی سریەیەکی تایبەتی بووە.زۆربەی کاتەکان هەر شەڕی موسلمانان بووە لەگەلّ دوژمندا. زانایانی ئوسولّی فیقهیش(اصول الفقه) وتویان:(المنطوق اذا خرج مخرج الغالب أو علی حادثة فلا مفهوم له) وەك ئەم ئایەتە خودای گەورە دەفەرموویت: ﴿وَلَا تُكْرِهُوا فَتَيَاتِكُمْ عَلَى الْبِغَاءِ إِنْ أَرَدْنَ تَحَصُّنًا﴾[3] کەنیزەکانتان ناچاری داوێن پیسی مەکەن ئەگەر ویستیان داوێن پاك بن. وەك ئەم ئایەتەش کە دەفەرموویت: ﴿وَرَبَائِبُكُمُ اللَّاتِي فِي حُجُورِكُمْ مِنْ نِسَائِكُمُ﴾[4] ئەوکیژانەی خۆتان بەخێوتان

---

[1] فتح الباري(٦/٥٩١)، مسلم(٤/٢١١٨).

[2] المزمل(٢٠).

[3] النور(٣٣).

[4] النساء(٢٣).

کردوون لەژنەکاتانن. ئیمامی ئەحمەد ڕیوایەتی کردووە لە یەعلای کوڕی ئومویەوە وتی: پرسیارم کرد لە عومەری کوڕی خەتاب وتم: خودای گەورە دەفەرمووێت: ﴿فَلَيْسَ عَلَيْكُمْ جُنَاحٌ أَن تَقْصُرُوا مِنَ الصَّلَوٰةِ إِنْ خِفْتُمْ أَن يَفْتِنَكُمُ الَّذِينَ كَفَرُوا﴾ ئایا خودا خەڵکی دڵنیا(بێ ترس) کردووە؟ عومەر(ڕەزای خودای لێ بێت) پێی وتم: سەرم لەوە سوڕماوە کە تۆ سەرت لێ سوڕماوە. پرسیارم لە پێغەمبەری خودا کرد(ﷺ) لەبارەیەوە فەرمووی:(بەخششێکە خودا پێی بەخشیون دەی ئێوەش لێی وەربگرن)[1] موسلیمو خاوەنی فەرموودەکانی تریش ڕیوایەتیان کردووە، تیرمیزی وتی: ئەم فەرموودەیە، فەرموودەیەکی حەسەنی غەریبە[2] ئەبوبەکری کوڕی ئەبوشەیبە ڕیوایەتی کردووە لە ئەبو حەنزەلەی حەزائەوە(الحذاء)، وتی: پرسیارم کرد لە ئیبنو عومەر لەبارەی نوێژی سەفەرەوە وتی: دوو ڕکاتە، وتم: ئەی ئەم ئایەتە کە خودای گەورە دەفەرمووێت: ﴿إِنْ خِفْتُمْ أَن يَفْتِنَكُمُ الَّذِينَ كَفَرُوا﴾ چی لێدەکەی کە ئێمە بێ ترسو دڵنیاین؟ وتی: سوننەتی پێغەمبەری خودایە(ﷺ)[3] بوخاری ڕیوایەتی کردووە لە ئەنەسەوە وتی: لەگەڵ پێغەمبەری خودادا دەرچووین لە مەدینەوە بۆ مەککە دوو ڕکات دوو ڕکات نوێژی دەکرد هەتا گەڕاینەوە بۆ مەدینە. وتم: هیچ مانەوە لە مەککە؟ وتی: دە ڕۆژ تێیدا ماینەوە[4] هەر بەم شێوەیە زانایانی تری فەرموودەش هێناویانە.[5] ئیمامی ئەحمەد ڕیوایەتی کردووە لە حارسەی کوڕی وەهەبی حوزاعیەوە، وتی: لەگەڵ پێغەمبەری خودادا نوێژی نیوەڕۆو عەسرم کرد لە مینا بە دوو ڕکات، خەڵکێکی زۆری لێ بوو ترسیش نەبوو[6] زانایانی فەرموودە ڕیووایەتیان کردووە جگە لە ئیبن ماجە[7] ئەمە قسەی بوخاریە کە وتی: پێغەمبەری خودا(ﷺ) نوێژی بۆکردین بە دوو ڕکات، ئەوەی لە میناداب‌وو ترسی نەبوو[8].

﴿وَإِذَا كُنتَ فِيهِمْ فَأَقَمْتَ لَهُمُ الصَّلَوٰةَ فَلْتَقُمْ طَآئِفَةٌ مِّنْهُم مَّعَكَ وَلْيَأْخُذُوٓا أَسْلِحَتَهُمْ فَإِذَا سَجَدُوا فَلْيَكُونُوا مِن وَرَآئِكُمْ وَلْتَأْتِ طَآئِفَةٌ أُخْرَىٰ لَمْ يُصَلُّوا فَلْيُصَلُّوا مَعَكَ وَلْيَأْخُذُوا حِذْرَهُمْ

---

[1] أحمد(١/٢٥) فەرموودەیەکی سەحیحە.

[2] مسلم(١/٤٧٨)، أبوداود(٢/٧)، تحفة الاحوذي(٨/٣٩٢)، النسائي في الكبرى(٦/٣٢٧)، ابن ماجه(١/٣٣٩).

[3] ابن أبي شيبة(٢/٤٤٧).

[4] فتح الباری(٢/٦٥٣).

[5] مسلم(١/٤٨١)، أبوداود(٢/٢٥)، تحفة الاحوذي(٣/١١٠)، النسائي(٣/١٢١)، ابن ماجه(١/٣٤٢).

[6] أحمد(٤/٣٠٦) فەرموودەیەکی سەحیحە.

[7] فتح الباری(٢/٦٥٥)، مسلم(١/٤٨٤)، أبوداود(٢/٤٩٣)، تحفة الاحوذي(٣/٦٢١)،النسائي(٣/١١٩).

[8] فتح الباری(٢/٦٥٥).

وَأَسْلِحَتَهُمْ وَدَّ الَّذِينَ كَفَرُوا لَوْ تَغْفُلُونَ عَنْ أَسْلِحَتِكُمْ وَأَمْتِعَتِكُمْ فَيَمِيلُونَ عَلَيْكُم مَّيْلَةً وَاحِدَةً وَلَا جُنَاحَ عَلَيْكُمْ إِن كَانَ بِكُمْ أَذًى مِّن مَّطَرٍ أَوْ كُنتُم مَّرْضَىٰ أَن تَضَعُوا أَسْلِحَتَكُمْ وَخُذُوا حِذْرَكُمْ إِنَّ اللَّهَ أَعَدَّ لِلْكَافِرِينَ عَذَابًا مُّهِينًا (١٠٢)﴾

**باسی نوێژی ترس و شێوەکانی**

خودای مەزن دەفەرمووێت: ﴿وَإِذَا كُنتَ فِيهِمْ فَأَقَمْتَ لَهُمُ الصَّلَاةَ فَلْتَقُمْ طَائِفَةٌ مِّنْهُم مَّعَكَ وَلْيَأْخُذُوا أَسْلِحَتَهُمْ فَإِذَا سَجَدُوا فَلْيَكُونُوا مِن وَرَائِكُمْ وَلْتَأْتِ طَائِفَةٌ أُخْرَىٰ لَمْ يُصَلُّوا فَلْيُصَلُّوا مَعَكَ وَلْيَأْخُذُوا حِذْرَهُمْ وَأَسْلِحَتَهُمْ وَدَّ الَّذِينَ كَفَرُوا لَوْ تَغْفُلُونَ عَنْ أَسْلِحَتِكُمْ وَأَمْتِعَتِكُمْ فَيَمِيلُونَ عَلَيْكُم مَّيْلَةً وَاحِدَةً﴾ ئەگەر تۆش(ئەی محمد ﷺ) لەگەڵیان(لە سەفەردابووی) تۆ نوێژت بۆدابەستن، با هەندێکیان بە چەکەوە نوێژ لە دوای تۆوە دابەستن، ئەگەر لە سوجدە بوونەوە بچنەدواوەو لە پشتەوە بتانپارێزن، ئینجا ئەوانەی لە نوێژدا بەژدارنەبوون، بێنە پێشیو نوێژ لەگەڵ تۆ دابەستنو ئاگایان لە خۆیانو چەکەکانیان بێت. خودانەناسان حەزدەکەن ئێوە ئاگاتان لە چەکو شتومەکەکانتان نەمێنێتو لەپڕ پەلامارتان بدەن. نوێژی ترس شێوازی زۆرە. جاری واهەیە دوژمن ڕووی بەقیبلەیەو جاری واش هەیە دوژمن ڕووی لە قیبلەوە نیە. وە نوێژ جاری واهەیە چوار ڕکاتیەو جاری واش هەیە سێ ڕکاتیە وەك مەغریب یان دوو ڕکاتیە وەك نوێژی بەیانی، نوێژی سەفەریش دەکرێت. وە جاری واش هەیە بە جەماعەت نوێژ دەکەن. ڕیکیش دەکەوێت لەکاتی شەڕدایە ناتوانن بە جەماعەت نوێژبکەنو بە تەنیا نوێژ دەکەن ڕووەو قیبلە یان پشت لە قیبلە بە پیادە یان بە سواری وڵاخ. کە حاڵەکە وابەە بۆیان هەیە بە ڕێگەدا بڕۆن هەر نوێژەکەیان نەبڕنو بەردەوام بن لەسەری.

هەندێك لە زانایان دەڵێن: ئەگەر حاڵەکەیان هەروابوو لەترسابوون یەك ڕکات نوێژ دەکەن، بە پێی فەرموودەکەی ئیبنو عەبباس کە وتویەتی: خودا لەسەر زمانی پێغەمبەرەکەتان(ﷺ) لە ماڵدا(لە شاردا) چوار ڕکاتە، لەسەفەردا دوو ڕکاتە، لەکاتی ترسدا یەك ڕکاتە، موسلیمو ئەبوداود و نەسائیو ئیبنوماجە ڕیوایەتیان کردووە[1] ئیمامی ئەحمەدیش هەر وای وتووە. مونزیری لە(الحواش) و عەتا جابیرو حەسەنو موجاهیدو حەکەمو قەتادەو حەمادو تاوسو زەحاکیش هەروایان وتووە. ئەبو عاسمی عەبادی(أبوعاصم العابدی) گێڕاوێتیەوە لە موحەممەدی کوڕی نەسری مەروزیەوە(المروزی) کە دەڵێت: نوێژی بەیانی لەکاتی ترسدا یەك ڕکاتە. ئیبنو حەزمیش هەر وای وتووە. ئیسحاقی کوڕی ڕاهەویەی(راهویە) وتی: لەکاتی ڕووبەڕووبوونەوە تەنیا ڕکاتێك بکەیتو ئاماژەیەکی بۆبکەی نوێژەکەت

---

[1] مسلم(٦٨٧)، أبوداود(١٢٤٧)، النسائي(٣/١٦٩)، ابن ماجه(١٠٦٨).

تەواوەو دروستە. ئەگەر هەر بۆت نەکرا تەنیا سوجدەیەکیش بەسە، چونکە ئەو سوجدەبردنە یادی خودایە. با لە پێشدا باسی هۆی هاتنەخوارەوەی ئەم ئایەتە بکەین، پاشان بێینەسەر باسی سیفەتەکەی. ئیمامی ئەحمەد ڕیوایەتی کردووە لە ئەبوعەیاشی زورقیەوە(الزرقي) وتی: لەگەڵ پێغەمبەری خودا بووین(ﷺ) لە(عوسفان) ڕوومان کردبووە بت پەرستەکان بەسەرۆکایەتی خالیدی کوڕی وەلید لەبەردەمماندا لە ڕووی قیبلەوە پێغەمبەری خودا(ﷺ) نوێژی نیوەڕۆی بۆکردین، بت پەرستەکان وتیان: ئا ئێستا بە یەك دەست بماندایە بەسەریاندا(کە ئاگایان لە خۆیان نیە) پاشان وتیان: وە ئێستا کاتی نوێژێکی تریان دێت کە لایان خۆشترە لە ماڵو گیانی خۆشیان، عەیاش وتی: لەناو نوێژی نیوەڕۆو عەسردا جوبرەئیل هاتەخوارەوە بەم ئایەتانەوە: ﴿وَإِذَا كُنتَ فِيهِمْ فَأَقَمْتَ لَهُمُ الصَّلَوٰةَ﴾ وتی: منیش لەوێ بووم، پێغەمبەری خودا(ﷺ) فەرمانی دا کە چەکەکانیان هەڵبگرن لەدوای خۆیەوە بە دوو ڕیز ڕیزی کردین، وتی: ڕکوعی بردو ئێمەش هەموو ڕکوعمان برد، پاشان سەری بەرزکردەوەو ئێمەش سەرمان بەرزکردەوە، پاشان پێغەمبەر(ﷺ) سوجدەی بەو ڕیزە برد کە لە دوای خۆیەوە بوون، ڕیزەکەی تر بە پێوە مانەوەو پاسەوانیان دەکرد. کاتێك کە سوجدەیان بردو هەستانەوە، ئەوانی تر دانیشتنو سوجدەیان لە شوێنەکەی ئەواندا برد، پاشان ڕیزەکەی تر هاتنە پێشەوە بۆ شوێنەکەی ئەوان، ئەوانیش چوونە ڕیزەکەی ئەوان پاشان پێغەمبەر ڕکوعی برد، ئەوانیش هەموو ڕکوعیان برد، پاشان سەری بەرزکردەوە ئەوانیش هەموو سەریان بەرزکردەوە. پاشان پێغەمبەرو(ﷺ) ئەو ڕیزەی کە لە پشتەوەبوو سوجدەیان برد، ڕیزەکەی تر بە پێوەبوون پاسەوانی ئەوانی دەکرد، کاتێك کە دانیشت، ڕیزەکەی تریش دانیشتنو سوجدەیان برد، پاشان سەلامی بۆدانەوە. پاشان هەستا. عەیاش وتی: پێغەمبەری خودا(ﷺ) دووجار نوێژی کرد، جارێك لە(عوسفان) و جاریکیش لە زەوی بەنی سولەیم[1] ئەبوداودو نەسائیش هەروا ڕیوایەتیان کردووە[2] ئەم فەرموودەیە پشتگیری زۆرەو سەنەدەکانیشی سەحیحە، لەوانە بوخاری ڕیوایەتی کردووە لە ئیبنو عەبباسەوە(ڕەزای خودایان لێ بێت) وتی: پێغەمبەر(ﷺ) هەستاو خەڵکیش لەگەڵی هەستانو الله أکبری کردو ئەوانیش لەگەڵی الله أکبریان کرد، ڕکوعی برد ئەوانش لەگەڵی ڕکوعیان برد، پاشان سوجدەی بردو ئەوانیش لەگەڵی سوجدەیان برد، پاشان جارێکی تر هەستایەوە، ئەوانەی سوجدەیان برد هەستانەوەو پاسەوانی براکانیان دەکرد، دەستەکەی تر هاتن ڕکوعو سوجدەیان لەگەڵدا برد،

---

[1] أحمد(٤/٥٩/٦٠) فەرموودەیەکی سەحیحە.

[2] أبوداود(٢/٢٨)، النسائي(٣/١٧٦/١٧٧) فەرموودەیەکی سەحیحە.

جەلکەکە هەموو نوێژیان دەکرد بەڵام پاسەوانی یەکتریان دەکرد[1] ئیمامی ئەحمەد ڕیوایەتی کردووە لە جابیری کوڕی عەبدوڵاوە کە پێغەمبەری خودا(ﷺ) نوێژی ترسی بۆکردن، ڕیزێك لەبەردەمیدا ڕاوەستان و ڕیزێکیش لە پشتیەوە، نوێژی بەوانەی پشتیەوە کرد بە یەك ڕکوع و دوو سوجدە، پاشان ئەوانە هاتن تاکو بچنە جێی هاوەڵەکانیان، ئەمانیش چوونە جێگاکانی ئەوان، پێغەمبەری خودا(ﷺ) نوێژی بەمانیش کرد بە یەك ڕکوع و دوو سوجدە، پاشان سەلامی دایەوە، پێغەمبەر(ﷺ) دوو ڕکاتی کرد، بەڵام ئەوان یەك ڕکاتیان کرد[2] نەسائیش ڕیوایەتی کردووە، بەڵام لە سەحیحی موسلیمدا بە واتایەکی تر هاتووە. زۆرێك لە خاوەنی فەرموودەکان ڕیوایەتیان کردووە لە سەحیح و سەنەنەو موسنەدەکانیاندا. ئیبنو ئەبی حاتەم ڕیوایەتی کردووە لە سالمەوە لە باوکیەوە وتی: ئەم ئایەتە کە خودای گەورە دەفەرموێت: ﴿وَإِذَا كُنتَ فِيهِمْ فَأَقَمْتَ لَهُمُ ٱلصَّلَوٰةَ﴾ لەسەر نوێژی ترس هاتووەتەخوارەوە، پێغەمبەر(ﷺ) بە یەك ڕکات نوێژی بۆ یەکێك لە دەستەکانی کرد، دەستەکەی تر ڕوو بە دوژمن وەستان، ئەم دەستەی کە ڕوو بە دوژمن وەستابوون هاتن و پێغەمبەری خودا(ﷺ) ڕکاتەکەی تری بۆکردن پاشان سەلامی دایەوە. پاشان هەردەستەیەك لەوانە هەستاو ڕکاتەکەی تری خۆی تەواورکرد.[3] ئەم فەرموودەیە زانایانی فەرموودە لە کتێبەکەیاندا هێناویانە لە ڕێگەی موعەمەرەوە بەم شێوەیە. ئەم فەرموودەیە ڕێگای تری زۆری هەیە لەلایەن کۆمەڵێك لە هاوەڵەکانی پێغەمبەرەوە(ﷺ) ئەبوبەکری کوڕی مەردەویهی(مردويه) و ئیبنو جەریریش هێناویانە. بەڵام هەڵگرتنی چەك لە نوێژی ترسدا کۆمەڵێك لە زانایان بە واجبیان داناوە بە پێی زاهیری ئەم ئایەتە کە خودای گەورە دەفەرموێت دەبێتە بەڵگە لەسەری. ﴿وَلَا جُنَاحَ عَلَيْكُمْ إِن كَانَ بِكُمْ أَذًى مِّن مَّطَرٍ أَوْ كُنتُم مَّرْضَىٰٓ أَن تَضَعُوٓاْ أَسْلِحَتَكُمْ وَخُذُواْ حِذْرَكُمْ﴾ ئەگەر باران تووشی نارەحەتیتان دەکات، یان نەخۆشی، ئەگر چەکەکاتان دانێن هیچ گوناهێکتان ناگات، بەڵام هەردەبێت وشیاربن. واتە: دەبێت بەردەوام لە ئامادەباشی دابن وەختێك کە پێویستان بە چەکەکانتان بوو خێرا هەڵیگرن ﴿إِنَّ ٱللَّهَ أَعَدَّ لِلْكَٰفِرِينَ عَذَابًا مُّهِينًا﴾ دیارە خودا بۆ ئەوانەی خودانەناسن، ئازاردانی ئابڕووبەری سازکردووە.

---

[1] فتح الباري(٢/٥٠٢).

[2] أحمد(٣/٢٩٨)ن النسائي(١٧٤)، مسلم(٨٤٠) فەرموودەیەکی سەحیحە.

[3] الدر المنثور(٢/٣٧٥) فەرموودەیەکی سەحیحە.

﴿فَإِذَا قَضَيْتُمُ ٱلصَّلَوٰةَ فَٱذْكُرُوا۟ ٱللَّهَ قِيَـٰمًا وَقُعُودًا وَعَلَىٰ جُنُوبِكُمْ ۚ فَإِذَا ٱطْمَأْنَنتُمْ فَأَقِيمُوا۟ ٱلصَّلَوٰةَ ۚ إِنَّ ٱلصَّلَوٰةَ كَانَتْ عَلَى ٱلْمُؤْمِنِينَ كِتَـٰبًا مَّوْقُوتًا ﴿١٠٣﴾ وَلَا تَهِنُوا۟ فِى ٱبْتِغَآءِ ٱلْقَوْمِ ۖ إِن تَكُونُوا۟ تَأْلَمُونَ فَإِنَّهُمْ يَأْلَمُونَ كَمَا تَأْلَمُونَ ۖ وَتَرْجُونَ مِنَ ٱللَّهِ مَا لَا يَرْجُونَ ۗ وَكَانَ ٱللَّهُ عَلِيمًا حَكِيمًا ﴿١٠٤﴾﴾

### فەرماندان بە زۆریادکردنی خودا دوای نوێژی ترس

خودای مەزن فەرمانی داوە کە زۆر یادی بکرێت لە دوای نوێژی ترس، هەرچەندە هنی خاوەن باوڕانیشی داوە کە لە هەموو کاتێکدا هەر یادی بکەن، بەڵام لێرەدا جەختی لەسەرکردووەتەوە لەبەرئەوەی زۆرێك لە پایەکانی نوێژی لەسەر کەم کردوونەتەوەو ڕێگەی پێداون کە هاتوچۆ بکەن لە نوێژی ترسداو چەندین شتی تریش کە لەکاتی ئاسایی دا ڕێگەی پێنەداون. وەك خودای گەورە لەبارەی مانگە حەرامەکانەوە دەفەرموێت: ﴿فَلَا تَظْلِمُوا۟ فِيهِنَّ أَنفُسَكُمْ﴾[1] لەمانەدا(لەم مانگانەدا) ناهەقی لە خۆتان مەکەن. هەرچەندە لە مانگەکانی تریشدا ناهەقی هەر حەرامە. بەڵام لێرەدا زیاتر جەختی لەسەر کردووەتەوە لەبەر زۆر حەرامیو گەورەیی تاوان تێیدا. هەربۆیە خودای مەزن دەفەرموێت: ﴿فَإِذَا قَضَيْتُمُ ٱلصَّلَوٰةَ فَٱذْكُرُوا۟ ٱللَّهَ قِيَـٰمًا وَقُعُودًا وَعَلَىٰ جُنُوبِكُمْ﴾ هەرکاتێك لە نوێژبوونەوە، بە پێوەو بە دانیشتن یان لەسەرلایەك ڕادەکشێن یادی خوداتان لە بیربێت. واتە: لە هەموو کاتێکدا یادی خوداتان لە بیربێت. پاشان دەفەرموێت: ﴿فَإِذَا ٱطْمَأْنَنتُمْ فَأَقِيمُوا۟ ٱلصَّلَوٰةَ﴾ لە وەختی دڵنیاییشدا(کە هیچ ترستان نەماوە) یادی خوداتان لەبیرنەچێت. نوێژەکانتان بەتەواوی بەجێ بێنن بەوشێوەیەی کە خودا فەرمانی پێداون بە گەردنکەچیو هۆشیو گۆشیو ڕکوعو سجودی تەواوەوە. پاشان خودای مەزن دەفەرموێت: ﴿إِنَّ ٱلصَّلَوٰةَ كَانَتْ عَلَى ٱلْمُؤْمِنِينَ كِتَـٰبًا مَّوْقُوتًا﴾ نوێژ لەسەر خاوەن باوەڕان نوسراوێکە(فەرزێکە) کاتی بۆدیاریکراوە. ئیبنو عەبباس وتی: فەرزێکەو کاتی بۆ دیارکراوە[2] دیسان ئیبنو عەبباس وتی: نوێژ کاتێکی دیاریکراوی هەیە وەك کاتی حەج[3] هەر بەم شێوەیە ڕیوایەت کراوە لە موجاهیدو سالمی کوڕی عەبدوڵای عەلی کوڕی حوسەینو موحەممەدی کوڕی عەلیو حەسەنو موقاتیلو سوددیو عەتیەی عەوفیەوە[4].

---

[1] التوبة(٣٦).

[2] الطبری(٩/١٦٩).

[3] الطبری(٩/١٦٩).

[4] الطبری(١٦٧/١٦٨)

**هاندان بۆ ڕاونانی دوژمن با برینداریش بێت**

خـودای مـەزن دەفـەرموویێت: ﴿ وَلَا تَهِنُوا۟ فِى ٱبْتِغَآءِ ٱلْقَوْمِ ﴾ لەدووکـەوتنی دوژمنـدا هـیچ سستی مەکەن. واتە: لاوازمەبن‌و بگەڕێن بـەدوای دوژمنـداو کوڵیـان لێمـەدەن‌و هـەموو سـەرە ڕێگـەکانیان لـێ بگرن‌و بچن بەگژیاندا ﴿إِن تَكُونُوا۟ تَأْلَمُونَ فَإِنَّهُمْ يَأْلَمُونَ كَمَا تَأْلَمُونَ ﴾ ئەگەر ئێوە بەهۆی ئەوانەوە تووشی ئازاردەبن، ئەوانیش(هەروەك ئێوە) بەدەست ئێوەوە تووشـی ئـازاردەبن. وەك خـودای گـەورە دەفـەرموویێت: ﴿إِن يَمْسَسْكُمْ قَرْحٌ فَقَدْ مَسَّ ٱلْقَوْمَ قَرْحٌ مِّثْلُهُۥ﴾[1] ئەگـەر ئێـوە برینـداربوون ئـەو خەڵکەش(دوژمنیشتان) وەك ئێوە برینداربووە. پاشان خودای گـەورە دەفـەرموویێت: ﴿وَتَرْجُونَ مِنَ ٱللَّهِ مَا لَا يَرْجُونَ ﴾ ئێوە ئومێدتان خودایە، ئەوان ئەو ئومێدەشیان نیە. واتە: ئێـوەو ئـەوان وەکویـەك تووشـی کوشتن‌و برینداربوون‌و ئێش‌وئازاربوون، بەڵام ئێوە بەهیوای پاداشت‌و یارمـەتی‌و پـشتیوانی خـودان، وەك بەڵێنی پێدان لە کتێبەکەیداو لەسەر زمانی پێغەمبەرەکەی(ﷺ) کە بـەڵێنێکی هـەق‌و هـەواڵێکی ڕاستە، بەڵام ئەوان هیچ ئومێدێکیان نیە لەویارەیـەوە. کەواتـە دەبێـت ئێـوە زیـاتر هـەوڵ بدەن‌و زیـاتر خۆتـان ماندوبکـەن بـۆ جێگیرکردنـی وتـەی(لا الـه الا الله) و بـەرزڕاگرتنی ﴿وَكَانَ ٱللَّهُ عَلِيمًا حَكِيمًا﴾ خـودا زانـای لەکارزانـە. خـۆی باشـتر دەزانێـت‌و لەکارزانەلەوبڕیارانـەی کـە دەیـدات‌و جێبـەجێی دەکـات دەربـارەی بوونەوەرو ئەو پەیامەی بۆ خەڵکی ناردووە. هەربۆیە خودا هەمیشە جێی سەپاس‌و ستایشە.

﴿إِنَّآ أَنزَلْنَآ إِلَيْكَ ٱلْكِتَـٰبَ بِٱلْحَقِّ لِتَحْكُمَ بَيْنَ ٱلنَّاسِ بِمَآ أَرَىٰكَ ٱللَّهُ ۚ وَلَا تَكُن لِّلْخَآئِنِينَ خَصِيمًا ﴿١٠٥﴾ وَٱسْتَغْفِرِ ٱللَّهَ ۖ إِنَّ ٱللَّهَ كَانَ غَفُورًا رَّحِيمًا ﴿١٠٦﴾ وَلَا تُجَـٰدِلْ عَنِ ٱلَّذِينَ يَخْتَانُونَ أَنفُسَهُمْ ۚ إِنَّ ٱللَّهَ لَا يُحِبُّ مَن كَانَ خَوَّانًا أَثِيمًا ﴿١٠٧﴾ يَسْتَخْفُونَ مِنَ ٱلنَّاسِ وَلَا يَسْتَخْفُونَ مِنَ ٱللَّهِ وَهُوَ مَعَهُمْ إِذْ يُبَيِّتُونَ مَا لَا يَرْضَىٰ مِنَ ٱلْقَوْلِ ۚ وَكَانَ ٱللَّهُ بِمَا يَعْمَلُونَ مُحِيطًا ﴿١٠٨﴾ هَـٰٓأَنتُمْ هَـٰٓؤُلَآءِ جَـٰدَلْتُمْ عَنْهُمْ فِى ٱلْحَيَوٰةِ ٱلدُّنْيَا فَمَن يُجَـٰدِلُ ٱللَّهَ عَنْهُمْ يَوْمَ ٱلْقِيَـٰمَةِ أَم مَّن يَكُونُ عَلَيْهِمْ وَكِيلًا ﴿١٠٩﴾﴾.

**فەرماندان بە دادوەری کردن بەوەی کە خودا ناردوویەتی**

خودای مەزن دەفەرموویێت: ﴿إِنَّآ أَنزَلْنَآ إِلَيْكَ ٱلْكِتَـٰبَ بِٱلْحَقِّ لِتَحْكُمَ بَيْنَ ٱلنَّاسِ بِمَآ أَرَىٰكَ ٱللَّهُ ۚ وَلَا تَكُن لِّلْخَآئِنِينَ خَصِيمًا ﴿١٠٥﴾ وَٱسْتَغْفِرِ ٱللَّهَ ۖ إِنَّ ٱللَّهَ كَانَ غَفُورًا رَّحِيمًا﴾ ئەم قورئانەمان بۆلای تۆ ناردووەتەخوارەوە ئەی محمد(ﷺ) کە هەرچی تێیدایە ڕاستە، سا تۆ بەهۆی ئەم قورئانە (وەك خودا

---

[1] ال عمران(١٤٠).

ڕێی نیشاندلوی) دادوەری لە نێوان خەڵکیدا، خۆت مەکە بە لایەنگری ناپاکان. لەبەرخودا بپاڕێوە کە لێت خۆشبێت، خودا لە گوناه دەبورێتو دلۆڤانە. لە هەردوو سەحیحەکەدا هاتووە لە زەینەبی کچی ئوموسەلەمەوە لە ئوموسەلەمەوە وتی: پێغەمبەری خودا(ﷺ) گوێی لە دەنگی ناکۆکیەك بوو لە بەردەم دەرگای ژوورەکەیدا، پێغەمبەر(ﷺ) ڕۆیشتە دەرەوە بۆ لایانو فەرمووی:(ئەوسا بزانن منیش تەنیا مرۆڤێکم وە من بڕیادەدەم بەپێی ئەوەی دەیبیستم جا لەوانەیە هەندێکتان قسەزانتربێتو بەڵگە زیاتر بهێنێتەوە لە هەندێکی ترتان، بەوهۆیەوە منیش بەسودی ئەو بڕیاردەدەم، هەرکەسێك بڕیارم بۆداو مافی موسڵمانێکم دایێ، ئەو بەدڵنییەوە کەمن پارچەیەك ئاگری بۆ بڕیاردەدەم، دەبا هەڵیگرێت یان وازی لێ بێنێت)[1] ئیمامی ئەحەدیش ڕیوایەتی کردووە لە ئوموسەلەمەوە وتی: دوو پیاوی ئەنساری هاتن بۆلای پێغەمبەری خودا(ﷺ) کێشەیەکی میرات لەنێوانیاندابوو ماوەی بەسەرداچووبوو هیچ کامیان بەڵگەیان بەدەستەوە نەبوو، پێغەمبەری خودا(ﷺ) فەرمووی: (ئێوە کێشەکانتان دێنن بۆلای من، بزانن منیش هەر مرۆڤم، لەوانەیە هەندێکتان زمان پاراوترینو بەڵگەی زیاتر بهێننەوە لە هەندێکی ترتان، منیش بڕیادەدەم لە نێوانتاندا بەپێی ئەوەی کە دەیبیستم، هەرکەسێك بڕیازم بۆداو مافی برا موسڵمانەکەیم دابێت، با وەری نەگرێت بێگومان من پارچەیەك لە ئاگری بۆدەبڕم(بڕیاردەدەم) لە ڕۆژی قیامەتدا بەو پارچە ئاگرە کە لە گەردنیدایە دەیهێنن) دووپیاوەکە گریان، هەردوکیان وتیان هەقی من بۆ براکەم، پێغەمبەری خودا(ﷺ) فەرمووی:(ئەوکاتە ئەوەتان بوتایە، بڕۆن دابەشی بکەن پاشان ئەوەی بە هەقی دەزانن بیکەن، پاشان تیروپشکی بخەنو دوایش هەرکەسەو گەردنی هاوەڵەکەی ئازاد بکات)[2] خودای مەزن دەفەرمووێت: ﴿وَلَا تُجَٰدِلۡ عَنِ ٱلَّذِينَ يَخۡتَانُونَ أَنفُسَهُمۡۚ إِنَّ ٱللَّهَ لَا يُحِبُّ مَن كَانَ خَوَّانًا أَثِيمٗا ﴿١٠٧﴾ يَسۡتَخۡفُونَ مِنَ ٱلنَّاسِ وَلَا يَسۡتَخۡفُونَ مِنَ ٱللَّهِ﴾ گیرەو کێشە لەگەڵ ئەوکەسانە مەکە کە لەگەڵ خۆیان خائینن. خودا ئەوکەسانەی خۆشناوێت کە زۆر خائینو گوناهبارن. شت لە خەڵك دەشارنەوە، خۆ ناتوانن لە خودا هیچ بشارنەوە، ئەمە ناڕەزایی دەربڕینە لە دووڕووەکان کە سروشتیان وایە لە خەڵکی دەشارنەوە. تا ڕووبەڕوویان نەوەستنو زەمیان نەکەن، کەچی لە خودا ناترسن کە ئاگای لە هەموو شاراوەکانیانەو ئەوەش کە لەناو دڵیاندایە، هەربۆیە خودای گەورە دەفەرمووێت: ﴿وَهُوَ مَعَهُمۡ إِذۡ يُبَيِّتُونَ مَا لَا يَرۡضَىٰ مِنَ ٱلۡقَوۡلِۚ وَكَانَ ٱللَّهُ بِمَا يَعۡمَلُونَ مُحِيطًا﴾ خودا لەگەڵیانە کاتێك کە شەوانە زۆر قسەدەکەن کە پێی ڕازی نیە، هەرکارێك ئەوان دەیکەن، دیارە خودا ئاگای لێیە. ئەمە هەڕەشەیەکی توندوتیژەو پاشان خودای گەورە دەفەرمووێت: ﴿ هَٰٓأَنتُمۡ هَٰٓؤُلَآءِ

---

[1] فتح الباری(٥/١٢٨)، مسلم(٣/١٣٣٧).

[2] أحمد(٦/٣٢٠) فەرموودەیەکی باشە(جید).

جَـٰدَلۡتُمۡ عَنۡهُمۡ فِی ٱلۡحَیَوٰةِ ٱلدُّنۡیَا فَمَن یُجَـٰدِلُ ٱللَّهَ عَنۡهُمۡ یَوۡمَ ٱلۡقِیَـٰمَةِ ﴾ وا ئێوە گریمان تا لەسەر دونیا ژیاون، توانیتان لایەنگیریان لێ بکەن‌و لەسەر ئەوانە بێنە جواب، ئایا لە ڕۆژی قیامەتدا توانای هەیە کارەکەیان بگرێتە ئەستۆ؟ واتە: وای دابنێن وا ئەوانە سەرکەوتن لە دونیادا بەپێی ئەو بڕیارەی بۆیان دەدرێت لەلایەن دادوەرەوە بە زاهیر، ئەوانەش کە بڕیارەکەیان بەسەردا دەدرێت بەو بڕیارە ڕازە دەبن. ئەی لە ڕۆژی قیامەتدا چۆن وەڵام دەدەنەوەو چی دەکەن لەبەردەم خودای گەورەدا کە ئاگاداری هەموو نهێنی‌و شاراوەکانیانە؟ وە ئەوکەسە کێیە لەو ڕۆژەدا پشتگیریان لێ دەکات‌و داواکەیان بۆدەباتە پێشەوە؟ واتە: هیچ کەسێك لەوڕۆژەدا هاوکاریان ناکات، هەربۆیە خودای گەورە دەفەرموێت: ﴿أَم مَّن یَكُونُ عَلَیۡهِمۡ وَكِیلࣰا ﴾ یان کێ هەیە کاەکەیان بۆبگرێتە ئەستۆ؟

﴿ وَمَن یَعۡمَلۡ سُوۤءًا أَوۡ یَظۡلِمۡ نَفۡسَهُۥ ثُمَّ یَسۡتَغۡفِرِ ٱللَّهَ یَجِدِ ٱللَّهَ غَفُورࣰا رَّحِیمࣰا ﴿١١٠﴾ وَمَن یَكۡسِبۡ إِثۡمࣰا فَإِنَّمَا یَكۡسِبُهُۥ عَلَىٰ نَفۡسِهِۦۚ وَكَانَ ٱللَّهُ عَلِیمًا حَكِیمࣰا ﴿١١١﴾ وَمَن یَكۡسِبۡ خَطِیۤـَٔةً أَوۡ إِثۡمࣰا ثُمَّ یَرۡمِ بِهِۦ بَرِیۤـࣰٔا فَقَدِ ٱحۡتَمَلَ بُهۡتَـٰنࣰا وَإِثۡمࣰا مُّبِینࣰا ﴿١١٢﴾ وَلَوۡلَا فَضۡلُ ٱللَّهِ عَلَیۡكَ وَرَحۡمَتُهُۥ لَهَمَّت طَّاۤىِٕفَةࣱ مِّنۡهُمۡ أَن یُضِلُّوكَ وَمَا یُضِلُّونَ إِلَّاۤ أَنفُسَهُمۡۖ وَمَا یَضُرُّونَكَ مِن شَیۡءࣲۚ وَأَنزَلَ ٱللَّهُ عَلَیۡكَ ٱلۡكِتَـٰبَ وَٱلۡحِكۡمَةَ وَعَلَّمَكَ مَا لَمۡ تَكُن تَعۡلَمُۚ وَكَانَ فَضۡلُ ٱللَّهِ عَلَیۡكَ عَظِیمࣰا ﴿١١٣﴾ ﴾

**هاندان بۆ تەوبەکردن‌و داوای لێبوردن لە خوداو هەڕەشەش لەوکەسانەی کە کاری خراپ دەکەن یان تاوانی خۆیان دەدەنەسەر بێ تاوانێك**

خودای مەزن باسی ڕێزو بەخشندەیی خۆی دەکات دەربارەی هەموو ئوانەی کە تەوبەدەکەن و دەگەڕێنەوە بۆلای لە هەرتاوانێك کە کردبێتیان‌و دەفەرموێت: ﴿ وَمَن یَعۡمَلۡ سُوۤءًا أَوۡ یَظۡلِمۡ نَفۡسَهُۥ ثُمَّ یَسۡتَغۡفِرِ ٱللَّهَ یَجِدِ ٱللَّهَ غَفُورࣰا رَّحِیمࣰا ﴾ هەرکەسێك کارێکی خراپ بکات یان غەدرێك لە خۆی بکات، پاشان لە خودا بخوازێت کە بیبەخشێت، دەبینێت خودا بەخشندەو دلۆڤانە. عەلی کوڕی ئەبوتەلحە لە ئیبنو عەبباسەوە وتی: خودای گەورە لەم ئایەتەدا بەندەکانی ئاگادار کردوە لە لێبوردەیی‌و دڵسۆزی‌و بەخشندەیی‌و بەزەیی فراوانی خۆی دەربارەی ئەوکەسانەی کە تاوانیان کردووە، تاوانەکانیان بچوك بێت یان گەورە، پاشان دێن‌و داوای لێبوردن دەکەن لە خودای گەورە، دەبینن خودای گەورە لێیان خۆشدەبێت. با گوناهەکانیشیان زۆر گەورەتر بووبێت لە ئاسمانەکان‌و زەمین‌و کێوەکانیش[1] ئیبنو جەریر ڕیوایەتی کردووە. ئیمامی ئەحمەد ڕیوایەتی کردووە لە عەلیەوە(ڕەزای خودای لێ بێت) وتی:

[1] الطبری(٩/١٩٥).

من کاتێك شتێکم بیستبێت لە پێغەمبەری خوداوە(ﷺ) بەوەی خودا خۆی مەیلی لێبووبێت سودی پێ گەیاندوم پێی. وە وتی: ئەبوبکر بۆیگێڕامەوە وتی: پێغەمبەری خودا(ﷺ) فەرموویەتی:(هیچ موسڵمانێك نیە تاوان بکات، پاشان دەسستنوێژێك بگرێتو دوو ڕکات نوێژ بکات، پاشان داوای لێبوردن لە خودا بکات بۆ ئەو گوناهەی کە کردوویەتی مەگین خودا لێی خۆشبووە) پاشان ئەم دوو ئایەتەی خوێند:[1] ﴿ وَمَن يَعْمَلْ سُوٓءًا أَوْ يَظْلِمْ نَفْسَهُۥ ﴾، ﴿وَٱلَّذِينَ إِذَا فَعَلُوا۟ فَٰحِشَةً أَوْ ظَلَمُوٓا۟ أَنفُسَهُمْ ﴾[2] ئەوکەسانەی هەرکاتێك کاری خراپ دەکەن، یان ناهەقی لەخۆیان دەکەن. پاشان خودای گەورە دەفەرموێت: ﴿وَمَن يَكْسِبْ إِثْمًا فَإِنَّمَا يَكْسِبُهُۥ عَلَىٰ نَفْسِهِۦ﴾ هەرکەسێك گوناهێك دەکات، گوناهەکەی زیان بەخۆی دەگەیەنێت، ئەم ئایەتە وەك ئەو ئایەتە وایە کە خودای گەورە دەفەرموێت: ﴿وَلَا تَزِرُ وَازِرَةٌ وِزْرَ أُخْرَىٰ﴾[3] هیچ کەسێك باری گوناهی کەسێکە تر ناگرێتە ئەستۆی خۆی. واتە: هیچ کەسێك سود بە هیچ کەس ناگەیەنێتو هەموو کەسێك لەسەر کردەوەی خۆی لێ پرسینەوەی لەگەڵ دەکرێت، کەس باری بۆ هەڵناگرێت، هەربۆیە خودای گەورە دەفەرموێت: ﴿وَكَانَ ٱللَّهُ عَلِيمًا حَكِيمًا ﴾ خودا زانای لەکارزانە. واتە: لە سۆزو بەزەیو دادپەروەری خودایە کە تاوانی هیچ کەسێك ناخاتەسەر کەسێکی تر. پاشان خودای گەورە دەفەرموێت: ﴿ وَمَن يَكْسِبْ خَطِيٓـَٔةً أَوْ إِثْمًا ثُمَّ يَرْمِ بِهِۦ بَرِيٓـًٔا فَقَدِ ٱحْتَمَلَ بُهْتَٰنًا وَإِثْمًا مُّبِينًا ﴿١١٢﴾ وَلَوْلَا فَضْلُ ٱللَّهِ عَلَيْكَ وَرَحْمَتُهُۥ لَهَمَّت طَّآئِفَةٌ مِّنْهُمْ أَن يُضِلُّوكَ وَمَا يُضِلُّونَ إِلَّآ أَنفُسَهُمْ ۖ وَمَا يَضُرُّونَكَ مِن شَىْءٍ ۚ وَأَنزَلَ ٱللَّهُ عَلَيْكَ ٱلْكِتَٰبَ وَٱلْحِكْمَةَ وَعَلَّمَكَ مَا لَمْ تَكُن تَعْلَمُ ﴾ هەرکەسێك بە هەڵە یان بە ئەنقەست، تاوانێکی لێ ڕوبداتو بیخاتەسەر بێ گوناهێك. ئاشکرایە باری تاوانی بوختانی لەسەرشانە. ئەگەر چاکەو بەزەیی خودا فریای تۆ نەکەوتایە، هەندێك لەوان بەتەمابوون ڕێت لێ ون بکەن،هەر خۆیان کە ڕێگە لە خۆ گوم دەکەن. ئەوان ناتوانن هیچ زیانێك لە تۆ بدەن، خودا کتێبی بۆناردویو فێری لەکارزانی کردووی، زۆرشتی وای فێری تۆ کردلە پێشدا نەتدەزانی.ئەم ئایەتە وەك ئەو ئایەتە وایە کە خودای مەزن دەفەرموێت: ﴿وَكَذَٰلِكَ أَوْحَيْنَآ إِلَيْكَ رُوحًا مِّنْ أَمْرِنَا ۚ مَا كُنتَ تَدْرِى مَا ٱلْكِتَٰبُ ﴾[4] بەو شێوەیەش، ئێمە لە فەرمانی خۆمان ئەم قورئانەمان(گیانێکمان)

---

[1] أحمد(١/٨). سەنەدەکانی.حەسەنە.

[2] ال عمران(١٣٥).

[3] الانعام(١٦٤).

[4] الشوری(٥٢).

ناردەلای تۆ، تۆش لە پێشدای نەتدەزانی کتێب کامەیە! تا کۆتایی سورەتەکە. وە دەفەرمووێت: ﴿وَمَا كُنتَ تَرْجُوٓاْ أَن يُلْقَىٰٓ إِلَيْكَ ٱلْكِتَٰبُ إِلَّا رَحْمَةً مِّن رَّبِّكَ﴾[1] خۆ ئەگەر بەزەیی پەروەردەت نەبووایە، تۆ هەر بەهیوا نەبوویت کە ئەم کتێبەت بۆ ڕەوانەبکرێت. هەربۆیە خودای گەورە دەفەرمووێت: ﴿وَكَانَ فَضْلُ ٱللَّهِ عَلَيْكَ عَظِيمًا﴾ چاکەی زۆر گەورەت لەگەڵدا کراوە لەلایەن خوداوە.

﴿لَّا خَيْرَ فِى كَثِيرٍ مِّن نَّجْوَىٰهُمْ إِلَّا مَنْ أَمَرَ بِصَدَقَةٍ أَوْ مَعْرُوفٍ أَوْ إِصْلَٰحٍۭ بَيْنَ ٱلنَّاسِ ۚ وَمَن يَفْعَلْ ذَٰلِكَ ٱبْتِغَآءَ مَرْضَاتِ ٱللَّهِ فَسَوْفَ نُؤْتِيهِ أَجْرًا عَظِيمًا ﴿١١٤﴾ وَمَن يُشَاقِقِ ٱلرَّسُولَ مِنۢ بَعْدِ مَا تَبَيَّنَ لَهُ ٱلْهُدَىٰ وَيَتَّبِعْ غَيْرَ سَبِيلِ ٱلْمُؤْمِنِينَ نُوَلِّهِۦ مَا تَوَلَّىٰ وَنُصْلِهِۦ جَهَنَّمَ ۖ وَسَآءَتْ مَصِيرًا ﴿١١٥﴾﴾

### چپەی چاك

خودای مەزن دەفەرمووێت: ﴿لَّا خَيْرَ فِى كَثِيرٍ مِّن نَّجْوَىٰهُمْ إِلَّا مَنْ أَمَرَ بِصَدَقَةٍ أَوْ مَعْرُوفٍ أَوْ إِصْلَٰحٍۭ بَيْنَ ٱلنَّاسِ﴾ زۆربەی سرتەو چپەکەیان سودی نیە، جا مەگین فەرمانکردن بێت بە ماڵ بەخشین یان کاری ڕەوا یان چاکردنی نێوان خەڵکی. ئیمامی ئەحمەد ڕیوایەتی کردووە لەو ئوموکەلسومی (كلثوم) کچی عوقبەوە (عقبة)، وتی: بیستم لە پێغەمبەری خوداوە(ﷺ) دەیفەرموو: (درۆزن نیە ئەوەی ئاشتەوایی دەخاتە نێوان خەڵکیەوەو قسەی چاك دێنێتو دەبات یان قسەی چاك دەکات)، ئوموکەلسوم وتی: گوێم لێ نەبووە لە هیچ شتێکدا ڕێگەی دابێت بەوقسانە کە خەڵکی دەیکات لە سێ شوێندا نەبێت: لەکاتی جەنگداو ئاشتەوایی لە نێوان خەڵکیداو کاتێك پیاو قسە لەگەڵ هاوسەری بکات یان ئافرەت قسە لەگەڵ مێردەکەیدا بکات. ئوموکەلسومی کچی عوقبە یەکێك بوو لەو ئافرەتە کۆچەریانەی کە پەیمانیان بە پێغەمبەری خودا دا(ﷺ)[2] زانایانی فەرموودە ڕیوایەتیان کردووە جگە لە ئیبنو ماجە.[3] ئیمامی ئەحمەد ڕیوایەتی کردووە لە ئەبودەردائەوە(أبودرداء) وتی: پێغەمبەری خودا(ﷺ) فەرموویەتی:(ئایا هەوڵتان بدەمێت لە پلەی چاکتر لە نوێژو ڕۆژیو ماڵ بەخشین؟) وتیان: بەڵێ ئەی پێغەمبەری خودا(ﷺ)، فەرمووی: (ئاشتەوایی نێوان(خەڵك)) وە فەرمووی: (تێکدانی(خراپکردنی) نێوان (خەڵك) کە تا شەڕە(هی الحالقه)) تیرمیزیو ئەبوداودیش ڕیوایەتیان کردووە[4] تیرمیزی وتی: فەرموودەیەکی حەسەنی سەحیحە. بۆیە خودای مەزن

---

[1] القصص(٨٦).

[2] أحمد(٦/٤٠٣) فەرموودەیەکی سەحیحە.

[3] فتح الباری(٥/٣٥٣)، مسلم(٤/٢٠١١)، أبوداود(٥/٢١٨)، النسائي في الكبرى(٥/١٩٣).

[4] أحمد(٦/٤٤٤) فەرموودەیەکی باشە(جيد).

دەفـەرمووێت: ﴿وَمَن يَفۡعَلۡ ذَٰلِكَ ٱبۡتِغَآءَ مَرۡضَاتِ ٱللَّهِ فَسَوۡفَ نُؤۡتِيهِ أَجۡرًا عَظِيمٗا﴾ هەرکەسێك لەبەر ڕەزای خودا هەرچی بکات، لە ڕۆژی دوایی دا پاداشتی گەورەی دەدەینێ. واتە: هەرکەسێك بەپاکیو بەتەمای پاداشتی ئەوەبێت لەلای خودا، خودا بەمزوانە پاداشتی زۆرو فراوانی دەدتێ.

## سزای ئەوانەی پێچەوانەی پێغەمبەر دەجولێتەوەو شوێنی ڕێی باوەڕداران ناکەوێت جەهەننەمە

خـودای مـەزن دەفـەرمووێت: ﴿وَمَن يُشَاقِقِ ٱلرَّسُولَ مِنۢ بَعۡدِ مَا تَبَيَّنَ لَهُ ٱلۡهُدَىٰ﴾ هەرکەسێك لـە پـاش ڕاستـی بۆدەرکەوتنو شـارەزابوونی لـەم دینـە، پێـچەوانەی پێغەمبـەر(ﷺ) بجولێتـەوە. واتـە: هەرکەسێك ڕێبازێك بگرێتەبەر کە پێچەوانەی ڕێبازی ئەو پەیامە بێت کە پێغەمبـەر(ﷺ) هێناویـەتی، ئەوە لەلایەكو ئەو پەیامەش لەلایەکی ترەوە، بەومەرجەی بە ئەنقەست بەوکارە هەڵسێت دوای ئەوەی ڕاستی بۆڕوون بووەتەوەو بۆی دەرکەوتووە. ﴿وَيَتَّبِعۡ غَيۡرَ سَبِيلِ ٱلۡمُؤۡمِنِينَ﴾ وە ڕێبازێك بگرێتەبەر کە ڕێـی بـاوەڕداران نیـە. ئـەم دەقـە پەیوەنـدە بـە دەقەکـەی پـێش خۆیـەوە، بـەڵام هەڵـدەگرێت ئەوڕێگرتنەبەرە بە پێچەوانەی دەقـی قورئـانو فـەرموودەی پێغەمبـەربێت یـان پێـچەوانەی کۆدەنگی زانایانی ئیسلام بێت کە بڕیاریان لەسەرداوە، خۆ دیارە کۆدەنگ زانایان بە هەڵە دنانرێتوەك ڕێزلێنانێك بۆیان وە بە گەورەزانینی پێغەمبەرەکەیان(ﷺ) کە فەرموودەی سەحەیحی زۆر لەوبارەیەوە هـاتووە. خـودای گـەورە هەڕەشـەی زۆر تونـدی هەیـە وەك لـەوبارەوە دەفـەرمووێت: ﴿نُوَلِّهِۦ مَا تَوَلَّىٰ وَنُصۡلِهِۦ جَهَنَّمَۖ وَسَآءَتۡ مَصِيرًا﴾ ئێمـە بەوڕێیەدادەبـەین کـە خـۆی هەڵبـژاردووە، تـا دەیبەینـە جەهەننـەمو دواڕۆژی خراپ دەبێت. واتە: ئەگەر ئەوڕێگەیەی گرتەبەر ئێمەش بەوشێوەیەی خـۆی پێـی هەستاوەو دڵی پێی خۆشە لەلای جوانو شیرین دەکەینو مۆڵەتی دەدەین وەك خودای گـەورە لـە ئایـەتێکی تـردا دەفەرمووێت: ﴿فَذَرۡنِي وَمَن يُكَذِّبُ بِهَٰذَا ٱلۡحَدِيثِۖ سَنَسۡتَدۡرِجُهُم مِّنۡ حَيۡثُ لَا يَعۡلَمُونَ﴾[1] تۆ من بهێڵە بۆ ئەوانـەی کە بەم قورئانە باوەڕناکەن، کەم کەم بۆیـان شل دەکـەم(ماوەیـان دەدەم) هەرخۆشیان هەستی پـێ نەکـەن وەك دەفـەرمووێت: ﴿فَلَمَّا زَاغُوٓاْ أَزَاغَ ٱللَّهُ قُلُوبَهُمۡ﴾[2] وەختێـك ئـەوان خۆیـان لادا، خوداش دڵـی ئەوان لادات. وە دەفەرمووێت: ﴿وَنَذَرُهُمۡ فِي طُغۡيَٰنِهِمۡ يَعۡمَهُونَ﴾[3] هەروەك هەن وازیان لـێ بنێـنن کە هەر بە نافەرمانیەوە سەرگەردان بن. خودای مـەزن ئـاگری جەهەننـەمی کـردووە بـە دوامـەنزەڵیان لـە ڕۆژی قیامەتدا، هەرکەسێك لە ڕێـی ڕاسـت لابدات، هـیچ ڕێگەیـەکی تـری نیـە جگـە لـە ئـاگر لـە ڕۆژی

---

[1] القلم(٤٤).

[2] الصف(٥).

[3] الانعام(١١٠).

قیامەتدا. وەك خودای گەورە دەفەرموێت: ﴿احْشُرُوا الَّذِينَ ظَلَمُوا وَأَزْوَاجَهُمْ﴾[1] ئەوانە لێك كۆكەنەوە كە ناهەقی پیشەیان بوو لەگەڵ هاوشێوەكانیان. وە دەفەرموێت: ﴿وَرَءَا الْمُجْرِمُونَ النَّارَ فَظَنُّوا أَنَّهُم مُّوَاقِعُوهَا وَلَمْ يَجِدُوا عَنْهَا مَصْرِفًا﴾[2] تاوانباران ئاگریان بە چاوی خۆیان دیت، زانیان هەر تێی دەكەونو هیچ دەرەتانێكیان نیە.

﴿إِنَّ اللَّهَ لَا يَغْفِرُ أَن يُشْرَكَ بِهِ وَيَغْفِرُ مَا دُونَ ذَٰلِكَ لِمَن يَشَاءُ ۚ وَمَن يُشْرِكْ بِاللَّهِ فَقَدْ ضَلَّ ضَلَالًا بَعِيدًا ﴿١١٦﴾ إِن يَدْعُونَ مِن دُونِهِ إِلَّا إِنَاثًا وَإِن يَدْعُونَ إِلَّا شَيْطَانًا مَّرِيدًا ﴿١١٧﴾ لَّعَنَهُ اللَّهُ ۘ وَقَالَ لَأَتَّخِذَنَّ مِنْ عِبَادِكَ نَصِيبًا مَّفْرُوضًا ﴿١١٨﴾ وَلَأُضِلَّنَّهُمْ وَلَأُمَنِّيَنَّهُمْ وَلَآمُرَنَّهُمْ فَلَيُبَتِّكُنَّ آذَانَ الْأَنْعَامِ وَلَآمُرَنَّهُمْ فَلَيُغَيِّرُنَّ خَلْقَ اللَّهِ ۚ وَمَن يَتَّخِذِ الشَّيْطَانَ وَلِيًّا مِّن دُونِ اللَّهِ فَقَدْ خَسِرَ خُسْرَانًا مُّبِينًا ﴿١١٩﴾ يَعِدُهُمْ وَيُمَنِّيهِمْ ۖ وَمَا يَعِدُهُمُ الشَّيْطَانُ إِلَّا غُرُورًا ﴿١٢٠﴾ أُولَٰئِكَ مَأْوَاهُمْ جَهَنَّمُ وَلَا يَجِدُونَ عَنْهَا مَحِيصًا ﴿١٢١﴾ وَالَّذِينَ آمَنُوا وَعَمِلُوا الصَّالِحَاتِ سَنُدْخِلُهُمْ جَنَّاتٍ تَجْرِي مِن تَحْتِهَا الْأَنْهَارُ خَالِدِينَ فِيهَا أَبَدًا ۖ وَعْدَ اللَّهِ حَقًّا ۚ وَمَنْ أَصْدَقُ مِنَ اللَّهِ قِيلًا ﴿١٢٢﴾﴾

## بتپەرستی لێبوردنی نیە، بت پەرستان لەڕاستیدا شەیتان دەپەرستن

لە پێشەوە قسە لەسەر ئەم ئایەتە كراوە كە خودای مەزن دەفەرموێت: ﴿إِنَّ اللَّهَ لَا يَغْفِرُ أَن يُشْرَكَ بِهِ وَيَغْفِرُ مَا دُونَ ذَٰلِكَ لِمَن يَشَاءُ﴾ خودا لەوانە نابورێت كە شەریكی بۆدادەنێن، جگە لەوەی كە مەیلی لە هەركەسێك بێت لێی دەبورێت. لە پێشەوە ئەو فەرموودانەی كە پەیوەندیان بەم ئایەتەوە هەبوو لەسەرەتای ئەم سورەتەدا هێنامانو باسمانكرد. پاشان خودای گەورە دەفەرموێت: ﴿وَمَن يُشْرِكْ بِاللَّهِ فَقَدْ ضَلَّ ضَلَالًا بَعِيدًا﴾ هەركەسێك شەریك بۆ خودا دابنێت لەڕادەبەدر گومڕایە. واتە: ئەوكەسە ڕێگەی ڕاستی نەگرتووەتەبەرو لە ڕێگەی ڕاست لایداوەو دووركەوتووەتەوە لێی، خۆی فەوتاندووەو ڕەنجەڕۆی دونیاو قیامەت بووەو بەخەوەری دونیاو قیامەتی لەدەستداوە. وە دەفەرموێت: ﴿إِن يَدْعُونَ مِن دُونِهِ إِلَّا إِنَاثًا﴾ ئەوانە جیاتی خودا هانا دەبەنەبەر بەردو شتی وا كە زۆربەیان ناوی مێینەیان هەیە. جوبەیر لە زەحاكەوە لەم ئایەتەدا وتی: بت پەرستەكان وتیان

---

[1] الصافات(٢٢).

[2] الكهف(٥٣).

فریشتەکان کچانی خودان[1] هەربۆیە دەیانپەرشتینو هەتا نزیکمان بخەنەوە لە خودا، وتی: ئایا ئەمانە دەکەونە گەورەی خۆیان بە وێنەی ئافرەت وێنەیان دەکێشنو لێیان دەپاڕێنەوەو ماڵاتیان بۆ گوێ شەق دەکەنو دەڵێن: ئەمانە لە کیژەکانی خودا دەچن کە دەیانپەرستین(مەبەستیان فریشتەکانە).

ئەم تەفسیرە لەم ئایەتە دەچێت کە خودای گەورە دەفەرموێت: ﴿أَفَرَءَيۡتُمُ ٱللَّٰتَ وَٱلۡعُزَّىٰ ١٩ وَمَنَوٰةَ ٱلثَّالِثَةَ ٱلۡأُخۡرَىٰٓ﴾[2] ئایا ئێوە هەر لاتو عوززاتان بووە؟ سێهەمیشتان(کەرمەنات) ە و یەکێکی تر لە بتەکانە؟ وە دەفەرموێت: ﴿وَجَعَلُواْ ٱلۡمَلَٰٓئِكَةَ ٱلَّذِينَ هُمۡ عِبَٰدُ ٱلرَّحۡمَٰنِ إِنَٰثًا﴾[3] ئەو فریشتانەی کە هەموویان بەندەی خودان، بە مێینەیان داناون. وە دەفەرموێت: ﴿وَجَعَلُواْ بَيۡنَهُۥ وَبَيۡنَ ٱلۡجِنَّةِ نَسَبًا﴾[4] جنۆکەیان لەگەڵ خودا کردە خزم. پاشان خودای گەورە لێرەدا دەفەرموێت: ﴿وَإِن يَدۡعُونَ إِلَّا شَيۡطَٰنًا مَّرِيدًا﴾ دیارە هاوار دەبەنەبەر ئەو شەیتانەی کە یاخی بووەو دەرکراوە. واتە: شەیتان فەرمان پێ کردونو جوانو شیرینی کردووە لەلایان، لەڕاستیدا ئەوانە شەیتان دەپەرستن وەك خودای گەورە دەفەرموێت: ﴿أَلَمۡ أَعۡهَدۡ إِلَيۡكُمۡ يَٰبَنِيٓ ءَادَمَ أَن لَّا تَعۡبُدُواْ ٱلشَّيۡطَٰنَ﴾[5] ئاخر ئەی نەوەی ئادەم، من لە پێشدا پەیمانم لەگەڵ نەبەستن. خودای مەزن باسی فریشتەکان دەکات کە لە ڕۆژی قیامەتدا دەڵێن بەو بت پەرستانە کە لە دونیا دەیانوت ئێمە فریشتەکان دەپەرستین ﴿بَلۡ كَانُواْ يَعۡبُدُونَ ٱلۡجِنَّۖ أَكۡثَرُهُم بِهِم مُّؤۡمِنُونَ﴾[6] بەڵکو ئەوانە جنۆکەیان دەپەرستو بەشی زۆریان باوەڕیان بەوان هێنابوو. خودای گەورە دەفەرموێت: ﴿لَّعَنَهُ ٱللَّهُۘ وَقَالَ لَأَتَّخِذَنَّ مِنۡ عِبَادِكَ نَصِيبًا مَّفۡرُوضًا﴾ خودا بەرنەفرینی خۆی خست، ئەویش لە وەڵامدا وتویەتی شەرتە لە عەبدەکانی تۆ بەشێك بۆ خۆم گلبدەمەوە. خودای مەزن کاتێك کە لە بەزەیی خۆی بێ بەشی کردو لەلای خۆی دەری کرد، شەیتانیش ئەو سوێندەی خوارد کە ژمارەیەکی تایبەتی بۆ خۆی جیابکاتەوە. موقاتیلی کوڕی حەیان وتی: لە هەزارکەس نۆسەدو نەوەدو نۆ کەس دەبات بۆ ناو ئاگرو تەنیا یەك کەس دەچێت بۆ بەهەشت.

---

[1] الطبري(٩/٢٠٩).

[2] النجم(١٩– ٢٠).

[3] الزخرف(١٩).

[4] الصافات(١٥٨).

[5] يس(٦٠).

[6] سبأ(٤١).

﴿وَلَأُضِلَّنَّهُمْ وَلَأُمَنِّيَنَّهُمْ﴾ شەیتان دەڵێت: دیاریشە لە ڕاستەڕێ لایان دەدەم‌و دڵیان پڕدەکەم لە ئاوات بۆخۆم. واتە: وایان لێدەکەم کە تەوبە نەکەو ئاواتەکانیان بۆ سازدەدەم‌و فەرمانیان پێ دەکەم پەلەنەکەن‌و تەوبەکردنیان پێ دوادەخەم، بە خۆیان دەیانخەڵەتێنم‌و بابی هەوایان دەکەم. ﴿وَلَآمُرَنَّهُمْ فَلَيُبَتِّكُنَّ ءَاذَانَ ٱلْأَنْعَـٰمِ﴾ فەرمانیان پێ دەکەم کە گوێچکەی ماڵاتەکانیان دادڕن. قەتادەو سوددیو کەسانی تریش وتویانە: واتە لەتکردنی گوێچکەیان تا بیکەنە نیشانە بۆ(بحیرەو سائبەو وصیلە)[1] ﴿وَلَآمُرَنَّهُمْ فَلَيُغَيِّرُنَّ خَلْقَ ٱللَّهِ﴾ فەرمانیشیان بۆ دەردەکەم کە شێوەو بیچمی ئەوشتانەی کە خودا دروستی کردووە تێکی بدەن‌و بیگۆڕن. ئیبنو عەبباس وتی: مەبەست پێی خەساندنی ئاژەڵە. حەسەنی کوڕی حەسەنی بەسری وتی: مەبەست پێی خاڵ کوتانە. لە سەحیحی موسلیمدا هاتووە کە خاڵ کوتان قەدەغەکراوە لە دەم‌وچاودا. وە لە وتەیەکدا هاتووە: خودا نەفرینی لەوکەسە کردووە کە ئەوشتەی کردووە.[2] وە لە هەردوو سەحیحەکەدا هاتووە لە ئیبنو مەسعودەوە کە وتویەتی: خودا نەفرینی کردووە لەو ژنانە کە خاڵ دەکوتن بۆ ژنانی تر، لەو ژنانەش خاڵیان بۆ دەکوتن، لەو ژنانەش کە ڕوخسار(دەم‌وچاو) هەڵدەگرن، وە لەوانەش کە دەم‌وچاویان بۆ هەڵدەگرن، لەو ژنانەش کە ددانەکانیان بۆ باریك‌و شاش دەکەن‌و بەوە دروستکراوی خودا دەگۆڕن. پاشان وتی: ئایا من نەفرین نەکەم لەوەی کە پێغەمبەری خودا(ﷺ) نەفرینی لێ کردووە کە خودا لە قورئاندا فەرمانی پێ کردوم کە پەیڕەوی بکەم مەبەستی ئەم ئایەتە بووە[3] کە خودای مەزن دەفەرموێت: ﴿وماءاتاكم الرسول فخذوه وما نهاكم عنه فانتهوا﴾[4] هەرچی پێغەمبەر دەتان داتێ، لێی وەربگرن. لە هەرچیش بێ بەشتان بکات دەستی بۆ مەبەن. وە لێردا خودای مەزن دەفەرموێت: ﴿وَمَن يَتَّخِذِ ٱلشَّيْطَـٰنَ وَلِيًّا مِّن دُونِ ٱللَّهِ فَقَدْ خَسِرَ خُسْرَانًا مُّبِينًا﴾ جا هەرکەسێك(بێجگە لە خودا) لەگەڵ شەیتان ببێتە دۆست، ئەوە بێگومان دیارە کە چەند زیانمەند دەبێت. واتە: ئەوکەسە زەرەرمەندی دونیاو قیامەتە، ئەو زەرەرەی کە هیچ شتێك قەرەبووی ناکاتەوە بۆی‌و نایگەڕێنێتەوە. ﴿يَعِدُهُمْ وَيُمَنِّيهِمْ ۖ وَمَا يَعِدُهُمُ ٱلشَّيْطَـٰنُ إِلَّا غُرُورًا﴾ بەڵێنیان پێ دەدات‌و کە دەیانخاتەسەر ئارەزوو، ئەو بەڵێنەی شەیتان بەوانی دەدات، فیروذان نەبێت چیتر نیە. وەك خودای مەزن باسی شەیتان

---

[1] الطبری(٩/٢١٤).

[2] مسلم(٣/١٦١٨)، فتح الباري(١٠/٣٩٢).

[3] فتح الباري(٨/٤٩٨).

[4]

دەکات لە ڕۆژی قیامەتداو دەفەرمووێت: ﴿ وَقَالَ ٱلشَّيْطَٰنُ لَمَّا قُضِىَ ٱلْأَمْرُ إِنَّ ٱللَّهَ وَعَدَكُمْ وَعْدَ ٱلْحَقِّ وَوَعَدتُّكُمْ فَأَخْلَفْتُكُمْ ۖ وَمَا كَانَ لِىَ عَلَيْكُم مِّن سُلْطَٰنٍ إِلَّآ أَن دَعَوْتُكُمْ فَٱسْتَجَبْتُمْ لِى ۖ فَلَا تَلُومُونِى وَلُومُوٓا۟ أَنفُسَكُم ۖ مَّآ أَنَا۠ بِمُصْرِخِكُمْ وَمَآ أَنتُم بِمُصْرِخِىَّ ۖ إِنِّى كَفَرْتُ بِمَآ أَشْرَكْتُمُونِ مِن قَبْلُ ۗ إِنَّ ٱلظَّٰلِمِينَ لَهُمْ عَذَابٌ أَلِيمٌ ﴾[1] لە پاش کارلەکارترازان، شەیتان دەڵێت: خودا بەڵێنی ڕاستی پێدان، منیش بەڵێنی خۆم پێدان، بەڵام درۆم لەگەڵ کردن، هیچ زۆریکیشم بەسەرتانەوە نەبوو، هەتا دەگاتە بێگومان ئەوانەی ستەمکارن ئازاری بە ژانیان دەبێت. پاشان خودای گەورە دەفەرمووێت: ﴿أُو۟لَٰٓئِكَ مَأْوَىٰهُمْ جَهَنَّمُ وَلَا يَجِدُونَ عَنْهَا مَحِيصًا ﴾ جێی ئەوانە جەهەننەمەو دەرتانی تریان نیە. واتە: ئەوانەی شەیتان بەڵێنی پێداونو بە هیواو ئارەزووی درۆینە فرینی دان دواڕۆژیان ئاگری جەهەننەمەو ڕزگاربوونیان نیە تێیداو لێی دەرناچن.

**پاداشتی بڕواداره ئاکارچاکەکان**

پاشان خودای مەزن باسی ژیانی خوداناسە بەختەوەرەکان دەکات کە چ پاشەڕۆژێکی ڕێزداری هەمیشەیی چاوەڕێیا دەکاتو دەفەرمووێت: ﴿وَٱلَّذِينَ ءَامَنُوا۟ وَعَمِلُوا۟ ٱلصَّٰلِحَٰتِ﴾ ئەوانەی کە خاوەن باوەڕو ئاکارچاکن. واتە: ئەوانەی بە دڵسۆزیو بە کردار سەلماندویانەو هەستاون بەوکارە چاکانەی کە فەرمانیان پێکراوەو وازیان هێناوە لەوکارە خراپانەی کە قەدەغەکراوە. ﴿سَنُدْخِلُهُمْ جَنَّٰتٍ تَجْرِى مِن تَحْتِهَا ٱلْأَنْهَٰرُ خَٰلِدِينَ فِيهَآ أَبَدًا﴾ دەیانبەینە ناو باخاتێك کە جۆرەها ڕووبار بە بەردەمیان دەڕواتو هەتاسەر هە تیای دەبن. واتە: دەچنە باخاتێك بە ئارەزووی خۆیان هەرکاتێكو بۆ هەرکوێیەك بیانەوێت دەڕۆنو هەرگیز ناگۆڕێتو لەناوناچێت. ﴿وَعْدَ ٱللَّهِ حَقًّا﴾ دیارە بەڵێنی خوداش ڕاستە. واتە: ئەمە بەڵێنێکە لەلایەن خوداوەیە، بەڵێنی خوداش زۆر ڕاستەو گومانی تێدانیە کە هەردێتەدی، هەربۆیە خودای گەورە بە مەسدەر(المصدر) کە بەڵگەیە لەسەر هاتنەدی ئەوشتەو ڕودانی کە وتەی ﴿حَقًّا﴾، پاشان خودای گەورە دەفەرمووێت: ﴿وَمَنْ أَصْدَقُ مِنَ ٱللَّهِ قِيلًا ﴾ کێ لە خودا ڕاستگۆترە؟ واتە: هیچ کەس لە خودا ڕاستگۆتر نیەو هەواڵی ڕاستر نیە، هیچ پەرستراوێك نیە بێجگە لە خوداو پەروەردگارش هەر ئەوە. پێغەمبەری خودا لە وتارێکدا فەرموویەتی:(بێگومان ڕاسترین قسە وتەی خودایە، وە چاکترین ڕێبازش ڕێبازی موحەممەد(ﷺ)، خراپترینەکانیش داهێنراوەکانیەتی وە

---

[1] ابراهیم(٢٢).

هەموو تازەگەرییەکیش(لە ئایندا دوای تەواوبوونی) داهێنراوە، هەموو داهێنراوێك گومڕاییە، هەموو گومڕاییەکیش لەناو ئاگردایە).

﴿ لَّيْسَ بِأَمَانِيِّكُمْ وَلَآ أَمَانِيِّ أَهْلِ ٱلْكِتَـٰبِ ۗ مَن يَعْمَلْ سُوٓءًا يُجْزَ بِهِۦ وَلَا يَجِدْ لَهُۥ مِن دُونِ ٱللَّهِ وَلِيًّا وَلَا نَصِيرًا ﴿١٢٣﴾ وَمَن يَعْمَلْ مِنَ ٱلصَّـٰلِحَـٰتِ مِن ذَكَرٍ أَوْ أُنثَىٰ وَهُوَ مُؤْمِنٌ فَأُو۟لَـٰٓئِكَ يَدْخُلُونَ ٱلْجَنَّةَ وَلَا يُظْلَمُونَ نَقِيرًا ﴿١٢٤﴾ وَمَنْ أَحْسَنُ دِينًا مِّمَّنْ أَسْلَمَ وَجْهَهُۥ لِلَّهِ وَهُوَ مُحْسِنٌ وَٱتَّبَعَ مِلَّةَ إِبْرَٰهِيمَ حَنِيفًا ۗ وَٱتَّخَذَ ٱللَّهُ إِبْرَٰهِيمَ خَلِيلًا ﴿١٢٥﴾ وَلِلَّهِ مَا فِى ٱلسَّمَـٰوَٰتِ وَمَا فِى ٱلْأَرْضِ ۚ وَكَانَ ٱللَّهُ بِكُلِّ شَىْءٍ مُّحِيطًا ﴿١٢٦﴾ ﴾

**سەرکەوتن بە ئاوات خواستن نیە، بەڵکو بە کاری چاکە**

خودای مەزن دەفەرمووێت: ﴿ لَّيْسَ بِأَمَانِيِّكُمْ وَلَآ أَمَانِيِّ أَهْلِ ٱلْكِتَـٰبِ ۗ مَن يَعْمَلْ سُوٓءًا يُجْزَ بِهِۦ ﴾ نە بە ئاواتی ئێوەو نە ئارەزووی ئەوکەسانەیە کە بە ئەهلی کتێب دادەنرێن، هەرمرۆڤێك کارێکی خراپ بکات، بەوکارەی خۆی سزادەدرێت. بۆمان باسکراوە کە موسڵمانەکان و ئەهلی کتێب، کتێبەکەشمان لە پێش کتێبەکەی ئێوە هاتووە. ئێمە لە ئێوە لەلای خودا لەپێشترین. موسڵمانەکانیش دەیانوت: ئێمە لە ئێوە لە پێشرین لەلای خودا، پێغەمبەرەکەشمان دوایین پێغەمبەرەو کتێبەکەشمان کتێبەکانی تری پێش خۆی نەسخ کردووەتەوە خودای مەزن ئەم ئایەتەی ناردەخوارەوە کە دەفەرمووێت: ﴿ لَّيْسَ بِأَمَانِيِّكُمْ وَلَآ أَمَانِيِّ أَهْلِ ٱلْكِتَـٰبِ ۗ مَن يَعْمَلْ سُوٓءًا يُجْزَ بِهِۦ ﴾ هەتا دەگاتە: ﴿ وَمَنْ أَحْسَنُ دِينًا مِّمَّنْ أَسْلَمَ وَجْهَهُۥ لِلَّهِ وَهُوَ مُحْسِنٌ ﴾ چ دیندارێك دینەکەی لەوکەسە چاکترە کە خۆی بە خودا سپاردووەو چاکەکارە. پاشان خودای گەورە بەڵگەی موسڵمانەکانی سەرخست بەسەر ئەوانەی ئەهلی کتێبدا کە دژایەتیان دەکردن[1] هەرواش ڕیوایەت کراوە لە سوددیو مەسروقو زەحاكو ئەبو سالحو کەسانی تریشەوە[2] هەر بەم شێوەیەش عەوفی ڕیوایەتی کردووە لە ئیبنو عەبباسەوە(ڕەزای خودای لێ بێت) کە لەم ئایەتەدا وتویەتی: ئەهلی دینەکان مشتومڕیان بوو لە نێوان خۆیاندا، ئەهلی تەورات دەیانوت: کتێبی ئێمە لە کتێبی ئێوە چاکترەو پێغەمبەرەکەشمان لە پێغەمبەری ئێوە چاکترە. ئەهلی ئینجیل هەر وایان دەوت. ئەهلی ئیسلامش وتیان: هیچ ئاینێك جگە لە ئیسلام نیە، کتێبی ئێمە گشت کتێبەکانی نەسخ کردووەتەوەو پێغەمبەرەکەشمان دوایین

[1] الطبری(٩/٢٢٩).

[2] الطبری(٩/٢٢٩/٢٣١).

پێغەمبەرە. فەرمان بە ئێمەو ئێوەش کراوە کە بڕوامان ببێت بە کتێبەکانی ئێوەو کار بەکتێبەکانی ئێمە بکەین. خودای گەورە کێشەکەی لە نێوانیاندا بڕیەوەو فەرمووی: ﴿لَّيْسَ بِأَمَانِيِّكُمْ وَلَآ أَمَانِيِّ أَهْلِ ٱلْكِتَٰبِ ۗ مَن يَعْمَلْ سُوٓءًا يُجْزَ بِهِۦ﴾[1] مانای ئەم ئایەتە ئەوەیە کە دینداری بە ئاوات خواستن و هەواو ئارەزوو نیە، بەڵکو دینداری بە دڵسۆزی و جێگیربوونی بڕوایە لە دڵداو کردار ڕاستیەکەی دەسەلمێنێت بەوەنیە هەرکەسێك بانگەشەی بۆ شتێك کردبێت، بەو بانگەشەیە ئەو شتەی بەدەست هێنابێت، نە ئەوکەسەی وتی: کە ئەو شایستەیەو خاوەن هەقە، هەر بەو قسەیە گوێی بۆ بگیرێت. هەتا لەلای خوداوە نیشانەیەکی بەدەستەوە نەبێت. هەربۆیە خودای گەورە دەفەرموێت: ﴿لَّيْسَ بِأَمَانِيِّكُمْ وَلَآ أَمَانِيِّ أَهْلِ ٱلْكِتَٰبِ ۗ مَن يَعْمَلْ سُوٓءًا يُجْزَ بِهِۦ﴾ واتە: نە بۆ ئەمانەو نە بۆ ئەوانیشە، هەر بە ئاوات خواستنێك ڕزگاریان ببێت، بەڵکو بەپێی گوێڕایەڵیانە بۆ خودای مەزن و شوێن کەوتنی ئەو پەیامەیە کە خودا لەسەر زمانی پێغەمبەرە بەڕێزەکان بۆی داناون. بۆیە خودای گەورە دەفەرموێت: ﴿مَن يَعْمَلْ سُوٓءًا يُجْزَ بِهِۦ﴾ ئەم ئایەتە وەك ئەو ئایەیە کە خودای گەورە دەفەرموێت: ﴿فَمَن يَعْمَلْ مِثْقَالَ ذَرَّةٍ خَيْرًا يَرَهُۥ ﴿٧﴾ وَمَن يَعْمَلْ مِثْقَالَ ذَرَّةٍ شَرًّا يَرَهُۥ﴾[2] هەرکەسێك بە سەنگایی مێرولەی هەرە وردیلە چاکەی هەبووبێت، دەیبینێت. وە هەرکەسێکیش بە سەنگایی مێرولەی هەرە وردیلە خراپەی هەبووبێت، دەیبینێت. ڕیوایەت کراوە کاتێك کە ئەم ئایەتە هاتەخوارەوە، زۆرێك لە هاوەڵەکان ئەوەیان زۆر بەلاوە گران بوو. ئیبنو ئەبی حاتەم ڕیوایەتی کردووە لە عایشەوە(ڕەزای خودای لێبێت) وتی: وتم ئەی پێغەمبەری خودا(ﷺ) من دەزانم توندترین ئایەت لە قورئاندا کامەیە، فەرمووی:(کامەیە ئەی عائیشە؟) وتم: ﴿مَن يَعْمَلْ سُوٓءًا يُجْزَ بِهِۦ﴾ فەرمووی:(ئەوەیە کە تووشی بەندەی خاوەن باوەڕ دەبێت(پاداشتە بۆی) هەتا هەر ناخۆشیەك کە تووشی دێت لە ناخۆشیەکان)[3] ئیبنو جەریرو ئەبوداودیش ڕیوایەتیان کردووە[4] سەعیدی کوڕی مەنسور ڕیوایەتی کردووە لە ئەبوهورەیرەوە(ڕەزای خودای لێ بێت) وتی: کاتێك ئەم ئایەتە هاتەخوارەوە ﴿مَن يَعْمَلْ سُوٓءًا يُجْزَ بِهِۦ﴾ زۆر کاری لە موسڵمانەکان کردو(ترساندنی) پێغەمبەری خودا(ﷺ) فەرمووی

---

[1] الطبری(٩/٢٣٠).

[2] الزلزلة(٧-٨).

[3] الطبری(٩/٢٤٤).

[4] الطبری(٩/٢٤٦)، أبوداود(٣/٤٧١).

پێیان:(کاردروستو میانڕەوبن، هەرچی ئەوشتانەی تووشی موسڵمان دەبێت کەفارەت بۆی، هەتا هەر دڕکێك کە دەچێت بە گیانیدا یان هەر ناخۆشیەك کە تووشی دەبێت)[1] ئەحمەدیش هەروا ڕیوایەتی کردووە لە سوفیانی کوڕی عوبەینەوە[2] موسلیمو تیرمیزیو نەسائیش ڕیوایەتیان کردووە[3] پاشان خودای گەورە دەفەرمووێت: ﴿وَلَا يَجِدۡ لَهُۥ مِن دُونِ ٱللَّهِ وَلِيّٗا وَلَا نَصِيرٗا﴾ جگە لە خودا هیچ کەس دەست ناکەوێت دۆستی بێتو بە هاواریەوە بێت. عەلی کوڕی ئەبو تەلحە لە ئیبنو عەبباسەوە وتی: مەگین تەوبە بکات، خوداش تەوبەی لێ وەردەگرێت[4] ئیبنو ئەبی حاتەم ڕیوایەتی کردووە. پاشان خودای گەورە دەفەرمووێت: ﴿وَمَن يَعۡمَلۡ مِنَ ٱلصَّٰلِحَٰتِ مِن ذَكَرٍ أَوۡ أُنثَىٰ وَهُوَ مُؤۡمِنٞ﴾ هەرکەسێك(نێر یان مێ) کە خاوەن باوەڕو ئاکارچاك بێت کاتێك کە خودای مەزن باسی پاداشتی کرد لەسەر خراپەو ئەوەی هەقیەتی دەبێت سزای خۆی وەربگرێت. خودای گەورە لە سزای دونیاو قیامەت لامان بدات، بە چاوپۆشیو سۆو بەزەیی خۆی. پاشان خودای مەزن دێتەسەر باسی چاکەو ڕێزو بەزەیی خۆی لە وەرگرتنی ئاکارەچاکەکان لە عەبدەکانی(چ نێرینە یان مێینە) بە مەرجی بڕوابوون. ﴿فَأُوْلَٰٓئِكَ يَدۡخُلُونَ ٱلۡجَنَّةَ وَلَا يُظۡلَمُونَ نَقِيرٗا﴾ کە بەمزوانە دەچێتە بەهەشت، هیچ ستەمێکیان لێ ناکاتو لەو چاکانەی کە کردوویانە بە ئەندازەی توێکڵی دەنکە خورمایەك(النقرة) ئەو تلیشە وردیلەیە بە پشتی دەنکە خورماوەیە. لە پێشەوە باسی(الفتیل) مان کرد ئەو دەزولەیە لە درزی دەنکە خورمادایە.(القطمیر) یش ئەو توێژاڵەیە بە ناوکی خورمادایە. هەرسێکیان لە قورئاندا هاتووە. خودای گەورە دەفەرمووێت: ﴿وَمَنۡ أَحۡسَنُ دِينٗا مِّمَّنۡ أَسۡلَمَ وَجۡهَهُۥ لِلَّهِ وَهُوَ مُحۡسِنٞ﴾ چ دیندریەك دینی لەوە چاکترە کە خۆی بە خودا سپاردووەو چاکەکارە؟ وە بە هیوای پاداشتی خودایە. واتە: لە کردارەکانیدا شوێنی ئەو پەیامە کەوتووە کە خودا بۆی داناوەو پێغەمبەرەکەی پێی هاتووە کە بریتیە لەو ڕاستەڕێو ئاینەهەقە، بێ ئەم دوو مەرجە کاری هیچ کەسێك تەواونابێت. واتە: دەبێت ئەوکارە لەبەر ڕەزای خوداو شوێن کەوتنی پەیامەکەی بێت، هەرکاتێك کار بە یەکێك لەم دوو مەرجە نەکرا، ئەوکارە خراپو بەتاڵە. هەرکەسێك لەبەر ڕوزامەندی خودا کاری نەکرد ئەوە دووڕووەو لەبەر خاتری خەڵکی دەیکات. هەرکەسێکیش شوێنی پەیامی خودا نەکەوت، ئەوە گومڕاو نەفامە، کەسێك ئەو دوو مەرجەی بەجێ هێنا ئەوا کارەکەی وەك کاری ئەو خاوەن باوەڕانیە کە خودا کارەکانیان لێ قبوڵ دەکاتو

---

[1] سعید بن منصور(٤/١٣٧٨) فەرموودەیەکی سەحیحە.

[2] أحمد(٢/٢٤٨) فەرموودەیەکی سەحیحە.

[3] مسلم(٤/١٩٩٣)، تحفة الاحوذي(٨/٤٠٠)، النسائي في الكبرى(٦/٣٢٨).

[4] الطبري(٩/٢٣٩).

چاوپۆشیش لە خراپەکانیان دەکات. هەربۆیە خودای گەورە دەفەرمووێت: ﴿وَٱتَّبَعَ مِلَّةَ إِبْرَٰهِيمَ حَنِيفًا﴾ کەوتووەتە شوێنی ئیبراهیمی لە ناڕەودا لادەرو بەرەو هەقی هاتوو. ئەوانەیش محمدو(ﷺ) شوێن کەوتوانی دەکەوت هەتا ڕۆژی قیامەت. وەك خودای گەورە لە ئایەتێکی تردا دەفەرموویەتی: ﴿إِنَّ أَوْلَى ٱلنَّاسِ بِإِبْرَٰهِيمَ لَلَّذِينَ ٱتَّبَعُوهُ وَهَٰذَا ٱلنَّبِىُّ﴾[1] ئەوکەسانەی لە هەموو کەس لە ئیبراهیم نزیکترن، ئەوانەن کە ئەوسا شوێنی دەکەوتنو ئەم پێغەمبەرە. وە لە ئایەتێکی تریشدا فەرموویەتی: ﴿ثُمَّ أَوْحَيْنَآ إِلَيْكَ أَنِ ٱتَّبِعْ مِلَّةَ إِبْرَٰهِيمَ حَنِيفًا ۖ وَمَا كَانَ مِنَ ٱلْمُشْرِكِينَ﴾[2] پاشان بە تۆمان ڕاگەیاند، کە پەیڕەوی ئاینی ئیبراهیمی بەرەو هەق چوونە، ئەو لەوانە نەبوو کە شەریك بۆ خودا دادەنێن.(الحنيف) لادان لە ناڕەواو بت پەرستیو وازهێنان لێی لەسەر چاوپۆشنیو بەرەوهەق چوون بە تەواویو بێ چەندوچوونو گوێ دانە هیچ کەسو هیچ شتێك.

## ئیبراهیم دۆستی خودایە

خودای مەزن دەفەرمووێت: ﴿وَٱتَّخَذَ ٱللَّهُ إِبْرَٰهِيمَ خَلِيلًا﴾ خودا ئیبراهیمی هەڵبژارد بە دۆستی خۆی. ئەمە لە بابی هاندانە بۆ شوێن کەوتنی، چونکە ئیبراهیم پێشەوایەکە پەیڕەوی دەکرێت گەیشتووەتە شوێنێك عەبدەکانی تر پێی ناگەن، گەیشتووەتە پلەی دۆستی خودا(درجة الخُلة) کە بەرزترین پلەیە لە پلەکانی خۆشەویستی، ئەمەش لەبەر زۆر گوێڕایەڵی بووە بۆ خودا. وەك خودای مەزن ستایشی دەکاتو دەفەرمووێت: ﴿وَإِبْرَٰهِيمَ ٱلَّذِى وَفَّىٰٓ﴾[3] وە ئیبراهیم ئەرکی تەواوی خۆی بەجێ هێنا. وە دەفەرمووێت: ﴿وَإِذِ ٱبْتَلَىٰٓ إِبْرَٰهِـۧمَ رَبُّهُۥ بِكَلِمَٰتٍ فَأَتَمَّهُنَّ﴾[4] ئەوسا خودا بە چەند وشە ئیبراهیمی تاقی کردەوە، ئەویش بەجێی هێنان. وە دەفەرمووێت: ﴿إِنَّ إِبْرَٰهِيمَ كَانَ أُمَّةً قَانِتًا لِّلَّهِ حَنِيفًا وَلَمْ يَكُ مِنَ ٱلْمُشْرِكِينَ﴾[5] ئیبراهیم پێشەوایەکی بەرەو هەق چووبوو، بە فەرمانی خودابوو، لە ڕیزی ئەوانەبوو کە شەریك بۆ خودا دانانێن. ﴿شَاكِرًا لِّأَنْعُمِهِ ۚ ٱجْتَبَىٰهُ وَهَدَىٰهُ إِلَىٰ صِرَٰطٍ مُّسْتَقِيمٍ﴾[6] چاکەی خودای

---

[1] ال عمران(٦٨).

[2] النحل(١٢٣).

[3] النجم(٣٧).

[4] البقرة(١٢٤).

[5] النحل(١٢٠).

[6] النحل(١٢١).

لەبەرچاودابوو، خوداش بۆ خۆی هەڵیبژاردو شارەزای ڕێگەی ڕاستی کردبوخاری ڕیوایەتی کردووە لە عەمری کوڕی مەیمونەوە وتی: مەعاز کاتێك چووە یەمەن نوێژی بەیانی بۆکردن ئەم ئایەتەی خوێند: ﴿وَٱتَّخَذَ ٱللَّهُ إِبْرَٰهِيمَ خَلِيلًا﴾ پیاوێك لەو کۆمەڵەدا وتی: بەڕاستی چاوی دایکی ئیبراهیم ڕۆشن بووەتەوە[1] بۆیە ناونراوە بە(خلیل الله) لەبەر زۆری خۆشەویستی خودای مەزن بۆی. لەبەر هەستانی بە گوێڕایەلی خودا، خوداش خۆشی دەوێ‌و لێی ڕازیە. هەربۆیە لە هەردوو سەحیحەکەدا هاتووە لە ئەبو سەعیدی خودەریەوە کە پێغەمبەری خودا(ﷺ) کاتێك وتاری بۆدەدان لە دواین وتاریدا، فەرمووی:(أما بعد، ئەی خەڵکینە ئەگەر من خۆشەویستم هەڵبژاردایە ئەبوبەکری قوفاحەم هەڵدەبژارد لە خەڵکی سەرزەمیندا. بەڵام هاوەڵەکەتان خۆشەویستی(دۆستی) خودایە)[2] وە لە ڕێگەی جوندەبی کوڕی عەبدوڵای عەمری کوڕی عاسەوەو عەبدوڵای کوڕی مەسعودەوە ڕیوایەت کراوە لە پێغەمبەرەوە(ﷺ) فەرمووی: (خودا منی هەڵبژاردووە بە خۆشەویستی خۆی هەروەك چۆن ئیبراهیمی هەڵبژاردووە بە خۆشەویستی خۆی)[3] خودای گەورە دەفەرموێت: ﴿وَلِلَّهِ مَا فِى ٱلسَّمَٰوَٰتِ وَمَا فِى ٱلْأَرْضِ﴾ هەرشتێك لەناو ئاسمانەکان‌و زەمیندایە هی خودایە. واتە: هەموو موڵك‌و بەندەو دروستکراوی خودایەو خۆی کاربەدەستی هەموو شتێکە، کەس بڕیاری ناگەڕێنێتەوەو ناتوانێت دەست بخاتەکاری، هەرچیش دەکات پرسیاری لێ ناکرێت لەبەر مەزنی‌و تواناو دادگەری‌و سۆزو بەزەیی فراوانی. ﴿وَكَانَ ٱللَّهُ بِكُلِّ شَىْءٍ مُّحِيطًا﴾ هەر خودایە لە هەمووشت ئاگادارە. واتە: زانیاری خودا هەمووشت دەگرێتەوە، هیچ شتێکی عەبدەکانی لەلا شاراوەو پەنهانی نیە. بە ئەندازەی گرانی گەردیلەیەك لە زانیاری خودا لە ئاسمانەکان‌و زەمیندا گوم نابێت. بچوکتر لە گەردیلەو گەورەترین ئاگاداری ئەوشتانەشە کە مەردوم دەیانبینێت‌و ئەوەیش کە لەبەرچاونیەو نادیارە.

﴿ وَيَسْتَفْتُونَكَ فِى ٱلنِّسَآءِ ۖ قُلِ ٱللَّهُ يُفْتِيكُمْ فِيهِنَّ وَمَا يُتْلَىٰ عَلَيْكُمْ فِى ٱلْكِتَٰبِ فِى يَتَٰمَى ٱلنِّسَآءِ ٱلَّٰتِى لَا تُؤْتُونَهُنَّ مَا كُتِبَ لَهُنَّ وَتَرْغَبُونَ أَن تَنكِحُوهُنَّ وَٱلْمُسْتَضْعَفِينَ مِنَ ٱلْوِلْدَٰنِ وَأَن تَقُومُوا۟ لِلْيَتَٰمَىٰ بِٱلْقِسْطِ ۚ وَمَا تَفْعَلُوا۟ مِنْ خَيْرٍ فَإِنَّ ٱللَّهَ كَانَ بِهِۦ عَلِيمًا ﴿١٢٧﴾ ﴾

---

[1] فتح الباری(٦٦٢/٧).

[2] فتح الباری(١٥/٧)، مسلم(١٨٥٤/٤).

[3] مسلم(٣٧٧/١)، ابن ماجه(٥٠/١)، مسلم(١٨٥٥/٤).

## حوکمی کچی هەتیو

خودای مەزن دەفـەرمووێت: ﴿ وَيَسْتَفْتُونَكَ فِي ٱلنِّسَآءِ قُلِ ٱللَّهُ يُفْتِيكُمْ فِيهِنَّ وَمَا يُتْلَىٰ عَلَيْكُمْ فِي ٱلْكِتَٰبِ ﴾ لە دەربارەی ژنانەوە لێت دەپرسن، بڵێ: بەهۆی ئەم کتێبە(کە بۆتـان دەخوێندرێتـەوە) خودا وەڵامی پرسیارەکانتان دەداتەوە. بوخاری ڕیوایەتی کردوو لە عایشەوە(ڕەزای خـودای لـێ بێـت) لــەم ئایەتـــەدا ﴿ وَيَسْتَفْتُونَكَ فِي ٱلنِّسَآءِ قُلِ ٱللَّهُ يُفْتِيكُمْ فِيهِنَّ ﴾ هــەتا دەگاتــە ﴿وَتَرْغَبُونَ أَن تَنكِحُوهُنَّ﴾ عائیشە وتی: ئەوپیاوەی کە هەتیوی لەلایە، ئەو سەرپەرشتیکەرو میراتگریەتی، پیاوەکە هەتیوەکە دەکاتە هاوبەشی خۆی لە سامانەکەیدا، هەتا لە قسەبۆکردنیشدا، حەزی لێیە مارەی بکاتو پێی ناخۆشە پیاوێکی تر مارەی بکاتو ببێتـە هاوبەشـی لـە سـامانەکەیداو خـۆیَ هاوبەشـیەتی، ڕێگە نادات شووبکات. ئەم ئایەتە هاتەخوارەوە[1] هەر بەم شێوەیە موسلیمش ڕیوایەتی کردووە[2] ئیبنو ئـەبی حاتەم ڕیوایەتی کردووە لە عائیـشەوە(ڕەزای خـودای لـێ بێـت) وتـی: پاشـان خـەڵکی پرسـیاریان لـە پێغەمبـەری خـودا کـرد(ﷺ) دوای ئـەو ئایەتـەی لەسـەریان هاتـەخوارەوە خـوداش ئـەم ئایەتـەی نـــاردەخوارەوە ﴿ وَيَسْتَفْتُونَكَ فِي ٱلنِّسَآءِ قُلِ ٱللَّهُ يُفْتِيكُمْ فِيهِنَّ وَمَا يُتْلَىٰ عَلَيْكُمْ فِي ٱلْكِتَٰبِ ﴾ وتی: ئەوەی خودا باسی کرد کە بۆیـان خوێندرایەوە بـەهۆی ئـەم کتێبـەوە. ئایەتی یەکەم بـوو کە خـودای گـەورە دەفـەرمووێت:[3] ﴿وَإِنْ خِفْتُمْ أَلَّا تُقْسِطُواْ فِي ٱلْيَتَٰمَىٰ فَٱنكِحُواْ مَا طَابَ لَكُم مِّنَ ٱلنِّسَآءِ ﴾[4] خـۆ ئەگەر نەتوانن بجوڵێنەوە لەگەڵ کیژە هەتیوەکاندا دەتوتانن وازیان لێ بێنن و ژنانی تر مارەبکەن. وە لێرەدا خودای گـەورە دەفـەرمووێت: ﴿فِي يَتَٰمَى ٱلنِّسَآءِ ٱلَّٰتِي لَا تُؤْتُونَهُنَّ مَا كُتِبَ لَهُنَّ ﴾ ئەو کیژانـەی کـە بـە هـەتیوی ماونەتـەوەو ئەوماڵـەی کـە دەیانکـەوێت، نایانـدەنێت ﴿وَتَرْغَبُونَ أَن تَنكِحُوهُنَّ﴾ دەتانەوێت لە خۆتانیان مارەبکەن. بـەم سـەنەدانە لـە عائیـشەوە ڕیوایـەت کـراوە، ئەگـەر کەسـێکتان حەزی کرد کسێکی هەتیو مارەبکات کیژەکە لە ژێرچاودێری خۆیدابوو بـەڵام زۆرجوان نـەبوو ماڵیـشی کەم بوو با مارەی بکات. بەڵام لێتان قەدەغەکرا کە کچێکی هەتیوو لەبەر جوانیو ماڵەکـەی مارەبکـەن مەگین بە دادپەروەرانە لەگەڵیان بجوڵێنەوە بەراکمبەر ئەوەی کە حەزیان لێ دەکەن. ئەمە لـە هـەردوو سەحیحەکەدا هاتووە. مەبەست لێرەدا ئەوەیە، ئـەو پیـاوەی کە کـچێکی هـەتیوو لەژێرچـاودێریدایە،

---

[1] فتح الباری(٨/١١٤).

[2] مسلم(٨/٣٠).

[3] الطبری(٩/٢٥٨).

[4] النساء(٣).

دروستە مارەی بکات، جاری وامەیە حەزدەکات مارەی بکات، خودای مەزن فەرمانی داوە کە خواستی دەبێت بەوشێوەیە مارەیی بداتێت کە بە ژنانی وەك خۆی دراوە، ئەگەر وای نەکرد، با وەك ژنەکان خۆی مارەیی بداتێت، خودای مەزن بەو شێوەیە ڕێگەی داوە[1] ئەم تەفسیرە بۆ ئایەتی یەکەمە لە سەرەتای سورەتەکەدا، جاری واش هەیە پیاوەکە حەزی لێ نیە مارەی بکات لەبەرئەوەی جوان نیە یان هەر لەبەر ماڵەکەی ڕێگەی نادات شووبکات، خودای گەورە قەدەغەی کردووە کە ڕێگری لێ بکات کە شووبکات، لە ترسی ئەوەی نەوەکو ببێتە هاوبەش لە ماڵەکەیدا کە ئەو هاوبەشیەتی. وەك عەلی کوڕی ئەبو تەلحە لە ئیبنو عەبباسەوە وتی: لەم ئایەتەدا کە خودای گەورە دەفەرمووێت: ﴿فِي يَتَٰمَى ٱلنِّسَآءِ﴾ ئەو کچانەی کە بەهەتیووی ماونەتەوە، وتی: پیاو لەکاتی نەفامیدا کە هەتیووێکی لەلابووایە، پۆشاکەکەی خۆی دەدا بەسەریدا، ئەگەر وتی بکردایە هەرگیز هیچ کەسێك نەیدەتوانی مارەی بکات، جا ئەگەر جوان و پێکەوتوو بووایەو حەزی لێ بکردایە مارەی دەکردو ماڵەکەی دەخوارد، ئەگەر جوانیش نەبووایە نەیدەهێشت هەرگیز شووبکات بەکەس هەتا دەمرد، ئەگەر بمردایە دەبووە میراتگری، خودای گەورە ئەوەی حەرام کردو نەیهێشت.[2] خودای گەورە دەفەرمووێت: ﴿وَٱلْمُسْتَضْعَفِينَ مِنَ ٱلْوِلْدَٰنِ﴾ هەروەها ئەو منداڵانەی کە چەوساوەو بێ دەرەتانن. لە چەرخی نەفمیدا، نە منداڵی بچوك و نە کچ میراتیان پێ دەدرا. وەك خودای مەزن دەفەرمووێت: ﴿لَا تُؤْتُونَهُنَّ مَا كُتِبَ لَهُنَّ﴾ ئەو کچانەی بە هەتیووی ماونەتەوە ئەو ماڵەی کە دەیانکەوێت، نایاندەنێ. خودای گەورە ئەوەی قەدەغەکردو بۆ هەرکەسەو بەشی خۆی بۆدانا و فەرمووی: ﴿لِلذَّكَرِ مِثْلُ حَظِّ ٱلْأُنثَيَيْنِ﴾[3] لە میراتیان بۆ نێرینە دووبەش و بۆ مێینە نیوەی بەشی مێینە بێت. بچوك بێت یان گەورە. سەعیدی کوڕی جوبەیرو کەسانی تریش هەروایان وتووە[4] سەعیدی کوڕی جوبەیر لەم ئایەتەدا وتی: ﴿وَأَن تَقُومُوا۟ لِلْيَتَٰمَىٰ بِٱلْقِسْطِ﴾ لەسەرتانە لەگەڵ هەموو هەتیووندا بە یەکسانی ڕەفتاربکەن. وەك کاتێك کە جوان و خاوەن ماڵە مارەی دەکەیت، هەربەوشێوەیەش کاتێك کە جوان نەبوو خاوەنی ماڵیش نەبوو هەر مارەی بکەو ڕێزی بگرەو بەرژەوەندی خۆت وازلێبێنەو پشتگوێی بخە بۆی.[5] خودای

---

[1] فتح الباری(٩/٦)، مسلم(٤/٢٤١٣).

[2] الطبری(٩/٢٦٤).

[3] النساء(١١).

[4] الطبری(٩/٢٥٥).

[5] الطبری(٩/٢٥٥).

گەورە دەفەرمووێت: ﴿وَمَا تَفۡعَلُواْ مِنۡ خَيۡرٖ فَإِنَّ ٱللَّهَ كَانَ بِهِۦ عَلِيمٗا﴾ هەرکارێکی چاك بکەن، لێتان ڕوون بێت کە خودا لێی ئاگادارە. ئەم هاندانە بۆ کاری خێرکردن‌و پەیڕەوی کردنی فەرمانی خودایە، بێگومان خودای مەزن ئاگاداری هەموو ئەوشتانەیە کە دەیکەن‌و پاداشتی لەسەر دەداتەوە، بە پاداشتێکی زۆر تێرو تەواوتر لەسەر ئەوکارانەی کە کردووتانە.

﴿وَإِنِ ٱمۡرَأَةٌ خَافَتۡ مِنۢ بَعۡلِهَا نُشُوزًا أَوۡ إِعۡرَاضٗا فَلَا جُنَاحَ عَلَيۡهِمَآ أَن يُصۡلِحَا بَيۡنَهُمَا صُلۡحٗاۚ وَٱلصُّلۡحُ خَيۡرٞۗ وَأُحۡضِرَتِ ٱلۡأَنفُسُ ٱلشُّحَّۚ وَإِن تُحۡسِنُواْ وَتَتَّقُواْ فَإِنَّ ٱللَّهَ كَانَ بِمَا تَعۡمَلُونَ خَبِيرٗا ﴿١٢٨﴾ وَلَن تَسۡتَطِيعُوٓاْ أَن تَعۡدِلُواْ بَيۡنَ ٱلنِّسَآءِ وَلَوۡ حَرَصۡتُمۡۖ فَلَا تَمِيلُواْ كُلَّ ٱلۡمَيۡلِ فَتَذَرُوهَا كَٱلۡمُعَلَّقَةِۚ وَإِن تُصۡلِحُواْ وَتَتَّقُواْ فَإِنَّ ٱللَّهَ كَانَ غَفُورٗا رَّحِيمٗا ﴿١٢٩﴾ وَإِن يَتَفَرَّقَا يُغۡنِ ٱللَّهُ كُلّٗا مِّن سَعَتِهِۦۚ وَكَانَ ٱللَّهُ وَٰسِعًا حَكِيمٗا ﴿١٣٠﴾﴾

**بڕیار دەربارەی ئەو پیاوەی کە گوێ بە ژنەکەی نادات**

خودای مەزن دەفەرمووێت: ﴿وَإِنِ ٱمۡرَأَةٌ خَافَتۡ مِنۢ بَعۡلِهَا نُشُوزًا أَوۡ إِعۡرَاضٗا فَلَا جُنَاحَ عَلَيۡهِمَآ أَن يُصۡلِحَا﴾ ئەگەر ژنێك هەستی پێکرد مێردەکەی گوێی پێنادات یان ڕووی لێ وەردەگێڕێت، هیچ تاوان نیە(ئاساییە) هەوڵی ئاشتبوونەوە بدەن. خودای گەورە باسی گوزەرانی پیاوو ژن دەکات‌و بەرنامەی بۆداناون کە چۆن هەڵسوکەوت لەگەڵ یەکتری بکەن، جارێك لەوکاتەی کە پیاوەکە قۆێ بە ژنەکەی نادات‌و پشتگوێی دەخات، جارێکی تر لەکاتی ڕێکەوتن‌و ئاشتبوونەوەداو جارێکی تریش لەکاتی جیابوونەوەو تەلاقدانیداز لە حالەتی یەکەمدا، ئەگەر ژنەکە دەترسا لە مێردەکەی کە بەجێی بهێڵێت‌و پشتی تێبکات، ئەو ژنە دەتوانێت دەست لە هەقی خۆی هەڵگرێت یان لە هەندێکی، لە نەفەقە یان لە پۆشاك یان مانەوە لەلای‌و گەلێك شتی تر لەوشتانەی کە هەیەتی بەسەر مێردەکەیەوە، پیاوەکەش دەبێت ئەوەی لێ قبوڵ بکات، ژنەکە هیچ گوناهێکی پێ ناگات بۆ دەست هەڵگرتنی لەو هەقانەی خۆی‌و بەخشینی بە پیاوەکەی، پیاوەکەش بە هەمان شێوە کە لێی قبوڵ کرد تاوانبار نابێت، بۆیە خودای گەورە دەفەرمووێت: ﴿فَلَا جُنَاحَ عَلَيۡهِمَآ أَن يُصۡلِحَا بَيۡنَهُمَا صُلۡحٗا﴾ هیچ گوناهیان ناگات هەوڵی ئاشتبوونەوە بدەن. پاشان خودای گەورە دەفەرمووێت: ﴿وَٱلصُّلۡحُ خَيۡرٞ﴾ ئاشتبوونەوە(لەو دوودڵیە) باشترە. واتە: ئاشتبوونەوە لەکاتی ناکۆکیەکەدا لە جیابوونەوە چاکترە، ئەبوداودی تیالیسی ڕیوایەتی کردووە لە ئیبنو عەبباسەوە وتی: سەودا ترسا لەوەی پێغەمبەری خودا(ﷺ) تەلاقی بدات، وتی: ئەی پێغەمبەری خودا(ﷺ) تەلاقم مەدە، ڕۆژەکەی خۆم دەدەم بە عائیشە، پێغەمبەریش(ﷺ) وایکرد،

ئـەم ئایەتـە هاتـەخوارەوە: ﴿وَإِنِ ٱمۡرَأَةٌ خَافَتۡ مِنۢ بَعۡلِهَا نُشُوزًا أَوۡ إِعۡرَاضًا فَلَا جُنَاحَ عَلَيۡهِمَآ﴾ ئیبنـو عەبباس وتی: لەسەر هەر شتێك ڕێکەوتن، ئەو ڕێکەوتنە دروستە.[1] تیرمیزیش ڕیوایەتی کردووەو وتـی: فەرموودەیەکی حەسەنی غەریبە.[2] وە لە هەردوو سەحیحەکەدا هاتووە لە عائیشەوە وتـی: کاتێك کە سەودەی کچی زەمعە چوویەساڵەوە ڕۆژەکەی خۆی بەخشی بە عائیشە، پێغەمبەری خودا(ﷺ) ڕۆژەکەی سەودەشی دەدابەو.[3] هەروەها لە سەحیحی بوخاریدا هاتووە.[4] دیسان بوخاری ڕیوایەتی کردووە لە عائیشەوە لەم ئایەتەدا: ﴿وَإِنِ ٱمۡرَأَةٌ خَافَتۡ مِنۢ بَعۡلِهَا نُشُوزًا أَوۡ إِعۡرَاضًا﴾ وتـی: پیاوی واهەبوو کە ژنی بە تەمەنی دەبوو زۆر گوێی پێنەدەداو دەیویست لێی جیاببێتەوە، ژنەکە پێی دەوت: دەربارەی من گەردنت ئازادبێت(بۆئەوەی لێی جیانەبێتەوە) ئەم ئایەتە هاتەخوارەوە.[5]

### ئاشتبوونەوە چاکترە( وَٱلصُّلۡحُ خَيۡرٌ )

خودای مەزن دەفەرموێت: ﴿وَٱلصُّلۡحُ خَيۡرٌ﴾ ئاشتبوونەوە چاکترە. عەلی کوڕی ئەبو تەلحە لە ئیبنو عەبباسەوە وتی: واتە: سەرپشکی کرد.(وووووو) واتە: پیاوەکە ئازادی بداتە دەست ژنەکەی بمێنێتەوە یان جیاببێتەوە. بەڵام جیابوونەوەکە چاکترە ئەگەر پیاوەکە هەر بەردەوام بوو لەسەری و لاساری و ڕێزی کەسی تریدا بەسەریداو هەقی خۆی نەدایەو بەباشی لەگەڵی نەجوڵایەوە.[6] بەڵام لە ئایەتەکەوە وادیارە، ئاشتبوونەوەیان چاکترە بەو مەرجەی لە هەقی خۆی هەندێك چاپۆشی بکات و پیاوەکەش لێی قبوڵ بکات، لە جیابوونەوەی یەکجاری. وەك چۆن پێغەمبەر(ﷺ) سەودەی کچی زەمعەی هێشتەوە لەسەر ڕۆژەکەی خۆی وازلێهێناو بەخشی بە عائشە(ڕەزای خودای لێ بێت)، پێغەمبەر(ﷺ) لێی جیانەبۆیەوەو لەگەڵ خێزانەکانی تریدا هێشتیەوە. ئەم کردارەی پێغەمبەر(ﷺ) بۆ ئەوەبوو کە ئوممەتەکەی چاوی لێ بکەن و بزانن دروستەو ڕێ پێدراوە، ئەمەش بۆ پێغەمبەر(ﷺ) زۆر چاکتربووەزچونکە خودای گەورە ئاشتبوونەوەی پێ خۆشترە لە جیابوونەوەو فەرموویەتی: ﴿وَٱلصُّلۡحُ خَيۡرٌ﴾ بەڵکو خودای گەورە زۆر ڕقی لە جیابوونەوەیە(تەڵاق) پاشان دەفەرموێت: ﴿وَأُحۡضِرَتِ ٱلۡأَنفُسُ ٱلشُّحَّۚ وَإِن تُحۡسِنُواْ وَتَتَّقُواْ فَإِنَّ ٱللَّهَ كَانَ بِمَا تَعۡمَلُونَ خَبِيرًا﴾ خۆشەویستی

---

[1] مسند الطيالسي(٣٤٩) فەرموودەیەکی حەسەنە.

[2] تحفة الاحوذي(٨/٤٠٣) فەرموودەیەکی حەسەنە.

[3] فتح الباری(٩/٢٢٣)، مسلم(٢/١٠٨٥).

[4] فتح الباری(٥/٢٥٧).

[5] البخاری(٤٦٠١).

[6] الطبری(٩/٢٧٢).

ماڵی دونیاش لەلای هەموو کەسێك هەیە، جا ئەگەر چاکە بکەن و خۆتان لە هەڵە بپارێزن، خودا لە هەرکارێك دەیکەن ئاگادارە. خۆ ئەگەر خۆڕاگرین لەسەر ئەو ناڕەحەتیەو ئەو بەناچاری ژیانە لەگەڵ ژنەکانتان و هەقی خۆیان بدەنێ وەك هاوشێوەکانیان، خودا ئاگای لەوەیەو پادشتێکی زۆر چاکتان دەداتەوە لە ڕۆژی قیامەتدا. وە دەفەرمووێت: ﴿ وَلَن تَسۡتَطِيعُوٓاْ أَن تَعۡدِلُواْ بَيۡنَ ٱلنِّسَآءِ وَلَوۡ حَرَصۡتُمۡ ﴾ ئێوە هەرچەندە هەوڵیشی بدەن، هەرگیز ناتوانن لەگەڵ ژنانی خۆتاندا بێ جیاوازی ڕەفتار بکەن. واتە: ئەی خەڵکینە هەرچەدنێك هەوڵبدەن کە بە یەکسانی لەگەڵ هاوسەرەکانتاندابجوڵێنەوە لە گشت لاکەوە ناتوانن با هەرچەندە بە ڕواڵەت هەر ژنەو بەشی خۆی بدەنێ لە شەوەکاندا. بێگومان هەر جیاوازی دەبێت لە خۆشەویستی و ئارەزوو سەرجێی کردن لەگەڵیاندا. وەك ئیبنو عەبباس و عوبەیدەی سەلمانی و حەسەنی بەسری و زەحاك وتویانە. ئیمامی ئەحمەدو زانایانی تری فەرموودەش ڕیوایەتیان کردووە لە عائیشەوە وتی: پێغەمبەری خودا(ﷺ) کاتەکانی دابەش کردبوو بۆ مانەوە لەلای خێزانەکانی بە دادپەروەرانەو پاشان دەیفەرموو:(ئەی خودایە ئەمە دابەشکردنی منە کە توانام بەسەریدا هەیە، لۆمەم مەکە کە لەوانەی کە تۆ دەستەڵاتت بەسەریدا هەیەو من دەستەڵاتم بەسەریدا نیە) مەبەست پێی دڵە. ئەم فەرموودەیە وتەی ئەبوداودە.[1] سەنەدەکانی سەحیحە. وە خودای مەزن دەفەرمووێت: ﴿فَلَا تَمِيلُواْ كُلَّ ٱلۡمَيۡلِ فَتَذَرُوهَا كَٱلۡمُعَلَّقَةِ﴾ سا ئەوەندە لە خۆتانیان دوورمەخەنەوە کە بیانکەنە هەڵپەساردەو سەرجێیان لەگەڵ نەکەن. واتە: بەتەواوی یەکێکیان پشتگوێ بخەیت و لێی نەپرسیتەوە، وەك ئەوەی کە هاوسەری نەبێت و تەڵاقیش درابێت. ئیبنو عەبباس و موجاهیدو سەعیدی کوڕی جوبەیرو حەسەن و زەحاك و ڕەبیعی کوڕی ئەنەس و سوددی و موقاتیلی کوڕی حەیان وتیان: واتە نە خاوەنی هاوسەربێت و نە تەڵاقیش درابێت.[2] ئەبوداودی تیالیسی ڕیوایەتی کردووە لە ئەبوهورەیرەوە، وتی: پێغەمبەری خودا(ﷺ) فەرموویەتی: (هەرکەسێك دوو ژنی هەبوو، گرینگی زیاتر بە یەکێکیان دەدات، واتە: ئەوەی تریانی پشتگوێ دەخست(کە ڕۆژی قیامەت هات شانێکی خوارە) واتە: لارەسەنگە)[3] پاشان خودای گەورە دەفەرمووێت: ﴿وَإِن تُصۡلِحُواْ وَتَتَّقُواْ فَإِنَّ ٱللَّهَ كَانَ غَفُورًا رَّحِيمًا﴾ ئەگەر لەگەڵیان پێك بێن و خۆتان لە گوناه بپارێزن، خودا خاوەنی لێبوردنەو دلۆڤانە. واتە: ئەگەر ئاشتەوابیتان کردو لەوەی کە دەستەڵاتان تێدا هەیە بە دادپەروەری دابەشتان کردو ترسی خوداتان لە دڵدابوو لە هەموو هەڵسوکەوتێکتاندا، خودای گەورە لێتان خۆش

---

[1] أبوداود(٢١/٣٤)، تحفة الاحوذي(١١٤٠)، ابن ماجة(١٩/٧١)، النسائي(٧/٦٣) سەنەدەکانی سەحیحە.

[2] الطبري(٩/٢٩٠-٢٩٢).

[3] مسند الطيالسي(٣٢٢) فەرموودەیەکی سەحیحە.

دەبێت لەوەی کە زیاتر بەلای هەندێکیاندا ئارەزوو دەکەن. پاشان خودای گەورە دەفەرمووێت: ﴿ وَإِن يَتَفَرَّقَا يُغْنِ ٱللَّهُ كُلًّا مِّن سَعَتِهِۦ ۚ وَكَانَ ٱللَّهُ وَٰسِعًا حَكِيمًا ﴾ خۆ ئەگەر هەربەیەکجاریش دەست لە یەکتر بەردەن خودا دەروی زۆری لەلایەو هەردووکیان بێ نیازدەکات. بەزەیی خودا فراوانەو هەر بۆخۆشی لەکارزانە. ئەوە قۆناغی سێیەمە، کە جیابوونەوەیە، خودای مەزن ئاگاداری داوە، کاتێك کە ویستان لە یەکتری جیاببنەوە، خودا لە یەکتری بێ نیازیان دەکات، خودا پیاوەکە تووشی ژنێك دەکات چاکتربێت لەم ژنەی‌و ژنەکەشی تووشی پیاوێك دەکات کە چاکتربێت لەم پیاوەی. ﴿وَكَانَ ٱللَّهُ وَٰسِعًا حَكِيمًا ﴾ بەزەیی‌و دلۆڤانی خودا زۆر فراوانە. واتە: خودا خاوەنی چاکەی زۆر فراوانە لە هەموو بڕیارو کردارو بەرنامەیەکیدا دلۆڤان‌و کاربەجێیە.

﴿ وَلِلَّهِ مَا فِى ٱلسَّمَٰوَٰتِ وَمَا فِى ٱلْأَرْضِ ۗ وَلَقَدْ وَصَّيْنَا ٱلَّذِينَ أُوتُوا۟ ٱلْكِتَٰبَ مِن قَبْلِكُمْ وَإِيَّاكُمْ أَنِ ٱتَّقُوا۟ ٱللَّهَ ۚ وَإِن تَكْفُرُوا۟ فَإِنَّ لِلَّهِ مَا فِى ٱلسَّمَٰوَٰتِ وَمَا فِى ٱلْأَرْضِ ۚ وَكَانَ ٱللَّهُ غَنِيًّا حَمِيدًا ﴿١٣١﴾ وَلِلَّهِ مَا فِى ٱلسَّمَٰوَٰتِ وَمَا فِى ٱلْأَرْضِ ۚ وَكَفَىٰ بِٱللَّهِ وَكِيلًا ﴿١٣٢﴾ إِن يَشَأْ يُذْهِبْكُمْ أَيُّهَا ٱلنَّاسُ وَيَأْتِ بِـَٔاخَرِينَ ۚ وَكَانَ ٱللَّهُ عَلَىٰ ذَٰلِكَ قَدِيرًا ﴿١٣٣﴾ مَّن كَانَ يُرِيدُ ثَوَابَ ٱلدُّنْيَا فَعِندَ ٱللَّهِ ثَوَابُ ٱلدُّنْيَا وَٱلْءَاخِرَةِ ۚ وَكَانَ ٱللَّهُ سَمِيعًۢا بَصِيرًا ﴿١٣٤﴾ ﴾

**ئامۆژگاری بە لەخواترسان**

خودای مەزن باسی ئەوە دەکات کە هەرخۆی خاوەنی ئاسمانەکان‌و زەمین‌و خۆشی فەرمانڕەوایەتی. وەك دەفەرمووێت: ﴿ وَلِلَّهِ مَا فِى ٱلسَّمَٰوَٰتِ وَمَا فِى ٱلْأَرْضِ ۗ وَلَقَدْ وَصَّيْنَا ٱلَّذِينَ أُوتُوا۟ ٱلْكِتَٰبَ مِن قَبْلِكُمْ وَإِيَّاكُمْ أَنِ ٱتَّقُوا۟ ٱللَّهَ ﴾ هەرچی لە ئاسمانەکان‌و زەمیندایە هی خودایە، ئەوکەسانەش لە پێش ئێوەدا کتێبی ئێمەیان بۆهات، ئێوەشمان ڕاسپاردووە کە دەبێت لە خودا بترسن‌و عیبادەتی خودا بکەن بە تەنیا کە شەریکی نیە، پاشان دەفەرمووێت: ﴿وَإِن تَكْفُرُوا۟ فَإِنَّ لِلَّهِ مَا فِى ٱلسَّمَٰوَٰتِ وَمَا فِى ٱلْأَرْضِ﴾ خۆ ئەگەر حاشاشی لێ بکەن، دیسان هەرچی کە لەناو ئاسمانەکان‌و زەویدایە هەر هی خودایە. وەك خودای گەورە لەبارەی موساوە کە وتویەتی بە هۆزەکەی فەرموویەتی: ﴿إِن تَكْفُرُوٓا۟ أَنتُمْ وَمَن فِى ٱلْأَرْضِ جَمِيعًا فَإِنَّ ٱللَّهَ لَغَنِىٌّ حَمِيدٌ ﴾[1] ئەگەر ئێوەو ئەوەش کە لەسەر زەمیندایە هەموو حاشا بکەن، بێگومان خودا بێ نیازەو هەر پەسەندی دەدرێ. وە دەفەرمووێت: ﴿فَكَفَرُوا۟ وَتَوَلَّوا۟ۚ

---

[1] ابراهیم(٨).

﴿وَّٱسْتَغْنَى ٱللَّهُۚ وَٱللَّهُ غَنِيٌّ حَمِيدٌ﴾[1] ئه‌وسا حاشایان کردو پوویان وه‌رگێڕاو خوداش بێ نیازبوو لێیان‌و خودا ده‌وڵه‌مه‌نده‌و شایسته‌ی ستایشه. بێ نیازه له عه‌بده‌کانی‌و ستایش کراوه له هه‌موو بڕیارو به‌رنامه‌یه‌کیدا. ﴿وَلِلَّهِ مَا فِى ٱلسَّمَٰوَٰتِ وَمَا فِى ٱلْأَرْضِۚ وَكَفَىٰ بِٱللَّهِ وَكِيلًا﴾ هه‌رچی له ئاسمانه‌کان‌و زه‌میندایه هی خودایه، هه‌ر خودا کارسازبێت به‌سه. واته: ئه‌و خودایه چاودێره به‌سه‌ر هه‌موو که‌سێکه‌وه‌و ده‌زانێت چی ده‌کات، ئاگادارو شایه‌ته به‌سه‌ر هه‌موو شتێکه‌وه. ﴿إِن يَشَأْ يُذْهِبْكُمْ أَيُّهَا ٱلنَّاسُ وَيَأْتِ بِـَٔاخَرِينَۚ وَكَانَ ٱللَّهُ عَلَىٰ ذَٰلِكَ قَدِيرًا﴾ ئه‌ی خه‌ڵکینه ئه‌گه‌ر خودا مه‌یلی لێ بێت، هه‌مووتان تەفروتونادەکات‌و له جێگه‌ی ئێوه خه‌ڵکی تر داده‌مه‌زرێنێت خودا ئه‌وکاره‌ی له‌ده‌ست دێت. واته: خودا ده‌توانێت ئێوه لابه‌رێت‌و بتانگۆڕێت به که‌سانی تر، ئه‌گه‌ر لاساری‌و سه‌رپێچیتان کرد. وه‌ك ئایه‌تێکی تردا فه‌رموویه‌تی: ﴿وَإِن تَتَوَلَّوْا۟ يَسْتَبْدِلْ قَوْمًا غَيْرَكُمْ ثُمَّ لَا يَكُونُوٓا۟ أَمْثَٰلَكُم﴾[2] ئه‌گه‌ر پشتی تێبکه‌ن، چینێکی تر به ئێوه ده‌گۆڕێته‌وه، که هه‌رگیز له ئێوه نه‌چن، وه ده‌فه‌رموێت: ﴿مَّن كَانَ يُرِيدُ ثَوَابَ ٱلدُّنْيَا فَعِندَ ٱللَّهِ ثَوَابُ ٱلدُّنْيَا﴾ کێ له ئێوه ده‌یه‌وێت له دونیا خۆش ڕابوێرێت با تێبگات که خۆشی دونیاو قیامه‌تیش وا له‌لای خودایه. واته: ئه‌ی ئه‌وکه‌سه‌ی هه‌موو ئاره‌زوو مه‌به‌ستێکی هه‌ر دونیایه، چاك بزانه که‌پاداشتی دونیاو قیامه‌ت هه له‌لای خودایه، ئه‌گه‌ر داوای هه‌ردووکیانی لێ بکه‌یت له هه‌ردووکیان ده‌تداتی‌و ڕازیت ده‌کات. وه‌ك خودای گه‌وره ده‌فه‌رموێت: ﴿فَمِنَ ٱلنَّاسِ مَن يَقُولُ رَبَّنَآ ءَاتِنَا فِى ٱلدُّنْيَا وَمَا لَهُۥ فِى ٱلْـَٔاخِرَةِ مِنْ خَلَٰقٍ ﴿٢٠٠﴾ وَمِنْهُم مَّن يَقُولُ رَبَّنَآ ءَاتِنَا فِى ٱلدُّنْيَا حَسَنَةً وَفِى ٱلْـَٔاخِرَةِ حَسَنَةً وَقِنَا عَذَابَ ٱلنَّارِ ﴿٢٠١﴾ أُو۟لَٰٓئِكَ لَهُمْ نَصِيبٌ مِّمَّا كَسَبُوا۟﴾[3] له‌و خه‌ڵکه‌دا هی وا هه‌یه هه‌رده‌ڵێت: په‌روه‌ردگارمان، له دونیادا کامه‌رانمان بکه. ئه‌وانه له ڕۆژی قیامه‌تدا به‌شیان نیه، هی واش هه‌یه ده‌ڵێت: ئه‌ی په‌روه‌ردگارمان، هه‌م له دونیاو هه‌م له قیامه‌تدا تووشی خێرو خۆشیمان بکه‌و له ئازاری ئاگریش بمانپارێزه. ئائه‌وانه به‌پێی کرده‌وه‌یان به‌شیان ده‌بێت. وه ده‌فه‌رموێت: ﴿مَن كَانَ يُرِيدُ حَرْثَ ٱلْـَٔاخِرَةِ نَزِدْ لَهُۥ فِى حَرْثِهِۦ﴾[4] هه‌رکه‌سێك داهاتی دواڕۆژی بوێت، داهاتی زیاتر ده‌ده‌مێنێ. وه ده‌فه‌رموێت: ﴿مَّن كَانَ يُرِيدُ ٱلْعَاجِلَةَ عَجَّلْنَا لَهُۥ فِيهَا

---

[1] التغابن(٦).

[2] محمد(٣٨).

[3] البقرة(٢٠٠-٢٠٢).

[4] الشورى(٢٠).

مَا نَشَآءُ لِمَن نُّرِيدُ ﴾ هەتا دەکاتە ﴿ انظُرْ كَيْفَ فَضَّلْنَا بَعْضَهُمْ عَلَىٰ بَعْضٍ ﴾[1] هەرکەسێك خۆشی هەر لە دونیا دەوێت، ئاواتەکەی زوو پێکدێنین تێیدا بۆ هەرکەسێك مەیلمان لێ بێت(تا دەکاتە) دە بڕوانە چۆن هەندێکمان لەچاو هەندێك سەرخستووە. هەربۆیە خودای گەورە لێرەدا دەفەرمووێت: ﴿وَكَانَ اللَّهُ سَمِيعًا بَصِيرًا ﴾ خودا بیسەرو بینەرە.

﴿يَا أَيُّهَا الَّذِينَ آمَنُوا كُونُوا قَوَّامِينَ بِالْقِسْطِ شُهَدَاءَ لِلَّهِ وَلَوْ عَلَىٰ أَنفُسِكُمْ أَوِ الْوَالِدَيْنِ وَالْأَقْرَبِينَ ۚ إِن يَكُنْ غَنِيًّا أَوْ فَقِيرًا فَاللَّهُ أَوْلَىٰ بِهِمَا ۖ فَلَا تَتَّبِعُوا الْهَوَىٰ أَن تَعْدِلُوا ۚ وَإِن تَلْوُوا أَوْ تُعْرِضُوا فَإِنَّ اللَّهَ كَانَ بِمَا تَعْمَلُونَ خَبِيرًا (١٣٥)﴾

**فەرماندان بە هەستان بە دادپەروەری و شایەتی دان لەبەر ڕەزامەندی خودا**

خودای هەزن دەفەرمووێت: ﴿يَا أَيُّهَا الَّذِينَ آمَنُوا كُونُوا قَوَّامِينَ بِالْقِسْطِ ﴾ ئەی کۆمەڵی خاوەن باوەڕان بە یەکسانی و بێ جیاوازی(بەکاری خەڵکی ڕابگەن). خودای گەورە فەرمان دەکات بە عەبدە بڕوادارەکان کە بە دادپەروەری و یەکسانی کارەکانیان جێبەجێ بکەن و لە هەق لانەدەن و بەلای ڕاست و چەپ نەچن، با لەبەر ڕەزامەندی خودا تووشی تانەو تەشەری خەڵکیش بن. هەر لەسەر هەق بەردەوام بن و هاوکاری و یارمەتی و پشتگیری یەکتری بکەن لەسەر هەق و بەهانای یەکتریەوە بچن. خودای گەورە دەفەرمووێت: ﴿شُهَدَاءَ لِلَّهِ﴾ بۆ خودا شایەتی بدەن. وەك لە ئایەتێکی تریشدا فەرموویەتی: ﴿و أقيموا الشهادة لله﴾[2] کە شایەتی بۆ خودا بدەن. واتە: ئەو شایەتیە کە دەیدەن لەبەر ڕەزامەندی خودا بێت، ئەوکاتە شایەتیەکە ڕاست و دروست و ڕێك وپێکە و دوورە لە گۆڕین و شاردنەوەو دەستکاریەوە، بۆیە خودای گەورە دەفەرمووێت: ﴿وَلَوْ عَلَىٰ أَنفُسِكُمْ ﴾ هەرچەندە شایەتی دانەکەتان بە زیانی خۆتان بێت. وە ئەگەر پرسیاری شتێکت لێکرا هەق بڵێ با زیانەکەشی بگەڕێتەوە بۆ خۆت. بێگومان خودای گەورە دەرو دەکاتەوە لەوکەسانەی کە گوێڕایەڵی فەرمانەکانی ئەون لە هەرکارێکدا تووشی تەنگانە هاتن ﴿أَوِ الْوَالِدَيْنِ وَالْأَقْرَبِينَ ﴾ وە(با ئەو شایەتیە) بە زیانی دایك و باوك و خزمەکانیشتان بێت. چاوپۆشیان لێ مەکە، بەڵکو شایەتی ڕێك و ڕاست بدە، چونکە هەق سەروەرە بەسەر هەموو کەسێکدا(پێش دەخرێت بەسەر هەموو کەسێکیشدا) پاشان خودای گەورە دەفەرمووێت: ﴿إِن يَكُنْ غَنِيًّا أَوْ فَقِيرًا فَاللَّهُ أَوْلَىٰ بِهِمَا ﴾ ئەگەر شایەتی بۆ دراوان دەوڵەمەندبن یان هەژارین، ئەوا

---

[1] الاسراء(١٨-٢١).

[2]

خودا بۆ ئەوان دڵسۆزترە. واتە: لەبەر دەوڵەمەندی چاوپۆشی لێ مەکە، لەبەر هەژاریش بەزەییت پێیدا نەیەتەوەن خودا خۆی ئاگای لێیانەو بەڵکو زیاتر لە تۆ خاوەن بەزەییە دەربارەیانو باشتریش دەزانێت چی چاکترە بۆیانو لەبەرژەوەندی ئەوانە ﴿فَلَا تَتَّبِعُوا الْهَوَىٰ أَن تَعْدِلُوا﴾ مەکەونە شوێنی ئارەزووتان، ئەوان لە ڕێگە لابدەن. واتە: با هەواو ئارەزوو ڕەگەزپەرستیو کینەتان لە خەڵکی واتان لێ نەکات واز لە دادپەروەری بێننو لە ڕێگە لابدەن لە هەڵسوکەوتو کاروبارتاندا، بەڵکو هەمیشە پابەندبن بە دادپەروەریەوە لە هەموو کاتێکدا. وەك خودای گەورە دەفەرمووێت: ﴿وَلَا يَجْرِمَنَّكُمْ شَنَآنُ قَوْمٍ عَلَىٰ أَلَّا تَعْدِلُوا اعْدِلُوا هُوَ أَقْرَبُ لِلتَّقْوَىٰ﴾[1] دوژمنایەتیو قینی کۆمەڵێك هەڵتان نەنێن کە بە هەقانەت ڕەفتارنەکەن، بە یەکسانیو بێ جیاوازی ڕەفتارکردندەبێتەهۆی زیاتر نزیك بوونەوەتان لە خوداترسی. ئەمە قسەی عەبدوڵای کوڕی ڕەواحە کە هەر لەبارەی دادپەروەریەوە وتویەتی: کاتێك پێغەمبەر(ﷺ) ناردی بۆناو خەڵکی خەیبەر تا بەروبومو کشتوکاڵیان بخەملێنێت، ئەوانیش ویستیان بەرتیلی بدەنێ هەتا چاوی لێیانەوەبێتو هاوکاریان بکات لە خەملاندنەکەدان ئەویش وتی: سوێند بە خودا من لەلای کەسێکەوە هاتووم بۆلای ئێوە کە خۆشەویسترین کەسە لەلام، وە ئێوەش بە ئەندازەی مەیمونو بەراز ڕقم لێتانە، بەڵام خۆشەویستی ئەوو ڕقم لە ئێوە وام لێ ناکات کە دادپەروەر نەبم لە نێوانتاندا، ئەوانیش وتیان: ئا بەم(دادپەروەریە) ئاسمانو زەمین ڕاوەستاز پاشان خودای گەورە دەفەرمووێت: ﴿وَإِن تَلْوُوا أَوْ تُعْرِضُوا﴾ ئەگەر زمان بگۆڕن یان خۆتان لە شایەتی دان بدزنەوە. موجاهیدو کەسانی تریش لە زانایانی پێشینە دەڵێن: ﴿تَلْوُوا﴾ واتەك گۆڕانی شایەتیو تێکدانو دەستکاری کردنی.[2] (اللّيُّ) واتە: گۆڕینو درۆکردنی بە ئەنقەست. خودای گەورە دەفەرمووێت: ﴿وَإِنَّ مِنْهُمْ لَفَرِيقًا يَلْوُونَ أَلْسِنَتَهُم بِالْكِتَابِ﴾[3] هەر لەناو ئەواندا هی واش هەیە، جۆرێك زمانیان دەگەڕێ گوایە لە کتێبی خودا دەخوێننەوە.(الاعراض) واتە: شاردنەوەی شایەتیو وازلێهێنانی. خودای مەزن دەفەرمووێت: ﴿وَمَن يَكْتُمْهَا فَإِنَّهُ آثِمٌ قَلْبُهُ﴾[4] هەرکەسێکع لە شایەتی خۆی لابدات، بە دڵ خۆی تووشی گوناه دەکات. پێغەمبەر(ﷺ) فەرموویەتی:(چاکترین شایەت کەسێکە پێش ئەوە داوای

---

[1] المائدة(٨).

[2] الطبري(٩/٢٠٨).

[3] ال عمران(٧٨).

[4] البقرة(٢٨٣).

شایەتی لـێ بکرێت شایەتی بدات)[1] بۆیـە خـودای گـەورە هەڕەشـە لەوکەسانە دەکات کـە شایەتی دەگۆڕن و دەفەرموێت: ﴿فَإِنَّ اللَّهَ كَانَ بِمَا تَعْمَلُونَ خَبِيرًا﴾ لە هەرکارێك ئێـوە دەیکـەن، خـودا هەمیشە ئاگادارە. واتە: هەر بەو شێوە لە ڕۆژی قیامەتدا پاداشتان دەداتەوە.

﴿يَا أَيُّهَا الَّذِينَ آمَنُوا آمِنُوا بِاللَّهِ وَرَسُولِهِ وَالْكِتَابِ الَّذِي نَزَّلَ عَلَىٰ رَسُولِهِ وَالْكِتَابِ الَّذِي أَنزَلَ مِن قَبْلُ ۚ وَمَن يَكْفُرْ بِاللَّهِ وَمَلَائِكَتِهِ وَكُتُبِهِ وَرُسُلِهِ وَالْيَوْمِ الْآخِرِ فَقَدْ ضَلَّ ضَلَالًا بَعِيدًا (١٣٦)﴾

## فەرماندان بە بڕواهێنان پاش بڕواهێنانیش

خـودای مـەزن دەفـەرموێت: ﴿يَا أَيُّهَا الَّذِينَ آمَنُوا آمِنُوا بِاللَّهِ وَرَسُولِهِ﴾ ئـەی کۆمـەڵی خـاوەن باوەڕان بەردەوام بن لەسەر بڕوا بە خوداو پێغەمبەرەکەی. خودای گـەورە فـەرمان دەکات بـە عەبدە خاوەن باوەڕەکانی کە بڕوایان بە هەموو بـەش و لایـەن و پایـەکانی ئیسلام بتـەوبێت، ئەمـە لـە بەشی بەدەست هێنانی ئەوشتە نیە(تحصيل الحاصل) بـەڵکو لـە بەشـی باشـترکردنی ئەوشـتەیە. کـە زۆرتـر هەوڵی جێگیرکردن و زیاتر بەردەوام بوونەلەسەری. وەك موسڵمان لە هەموو نوێژێکدا دەڵێت: ﴿ اهْدِنَا الصِّرَاطَ الْمُسْتَقِيمَ﴾[2] لە ڕاستەڕێ شارەزامان بکە. واتە: وشیارمان بکـە تێیـداو زیـاتر ڕێنمـایی و بتـەومان بکە لەسەری. وە فەرمانی پێ کردون کە بڕوایـان بـە خـوداو پێغەمبەرەکـەی بێـت و وەك لـە ئایـەتێکی تریشدا فەرموویەتی: ﴿ يَا أَيُّهَا الَّذِينَ آمَنُوا اتَّقُوا اللَّهَ وَآمِنُوا بِرَسُولِهِ﴾[3] ئـەی کۆمـەڵی خـاوەن بـاوەڕان ترستان بە خودا هەبێت و بڕوا بە پێغەمبەرەکـەی ئـەو بێنن. پاشان دەفـەرموێت: ﴿وَالْكِتَابِ الَّذِي نَزَّلَ عَلَىٰ رَسُولِهِ وَالْكِتَابِ الَّذِي أَنزَلَ مِن قَبْلُ﴾ دەبێـت بڕواتـان بـەو قورئانـە هـەبێت بـۆ پێغەمبەرەکـەی نـاردووەو بڕواتـان بـەو کتێبـەش هـەبێت کـە بـەر لـە قورئـان نێـردراوە. ئەمـە بـۆ جنسە(جنس) هەموو کتێبەکانی تـریش دەگرێتـەوە کە لـە پێشەوە هـاتوون. وە لـەبارەی قورئانـەوە فەرموویەتی: ﴿نَزَّلَ﴾ چونکە بە جیاجیاو بەش بەش هاتووەتەخوارەوە لەسەر ڕوداو بـەپێی پێویستی بەندەکان بە دابەزینی لەبارەی ژیانی دونیاو ڕۆژی قیامەتیانەوە. بەڵام کتێبە پێشوەکان هـەر کتێبـەو هـەمووی بـە یـەکجاری هاتووەتـەخوارەوە.[4] بۆیـە خـودای گـەورە دەفـەرموێت: ﴿وَمَن يَكْفُرْ بِاللَّهِ

---

[1] مسلم(٣/١٣٤٤).

[2] الفاتحة(٣).

[3] الحديد(٢٨).

[4] التعبير بالانزال في حق القرءان أكثر من التعبير بالتنزيل

وَمَلَٰٓئِكَتِهِۦ وَكُتُبِهِۦ وَرُسُلِهِۦ وَٱلْيَوْمِ ٱلْءَاخِرِ فَقَدْ ضَلَّ ضَلَٰلًۢا بَعِيدًا ﴾ هەرکەسێکیش لە خوداو فریشتەکانیو پێغەمبەرانی خوداو ڕۆژی قیامەت حاشا بکات، لە ڕادەبەدەر گومڕایە. واتە: لەڕاستەڕێ لایداوەو سەری لێ شێواوە.

﴿ إِنَّ ٱلَّذِينَ ءَامَنُوا۟ ثُمَّ كَفَرُوا۟ ثُمَّ ءَامَنُوا۟ ثُمَّ كَفَرُوا۟ ثُمَّ ٱزْدَادُوا۟ كُفْرًا لَّمْ يَكُنِ ٱللَّهُ لِيَغْفِرَ لَهُمْ وَلَا لِيَهْدِيَهُمْ سَبِيلًۢا ﴿١٣٧﴾ بَشِّرِ ٱلْمُنَٰفِقِينَ بِأَنَّ لَهُمْ عَذَابًا أَلِيمًا ﴿١٣٨﴾ ٱلَّذِينَ يَتَّخِذُونَ ٱلْكَٰفِرِينَ أَوْلِيَآءَ مِن دُونِ ٱلْمُؤْمِنِينَ ۚ أَيَبْتَغُونَ عِندَهُمُ ٱلْعِزَّةَ فَإِنَّ ٱلْعِزَّةَ لِلَّهِ جَمِيعًا ﴿١٣٩﴾ وَقَدْ نَزَّلَ عَلَيْكُمْ فِى ٱلْكِتَٰبِ أَنْ إِذَا سَمِعْتُمْ ءَايَٰتِ ٱللَّهِ يُكْفَرُ بِهَا وَيُسْتَهْزَأُ بِهَا فَلَا تَقْعُدُوا۟ مَعَهُمْ حَتَّىٰ يَخُوضُوا۟ فِى حَدِيثٍ غَيْرِهِۦٓ ۚ إِنَّكُمْ إِذًا مِّثْلُهُمْ ۗ إِنَّ ٱللَّهَ جَامِعُ ٱلْمُنَٰفِقِينَ وَٱلْكَٰفِرِينَ فِى جَهَنَّمَ جَمِيعًا ﴿١٤٠﴾ ﴾

**گوزەرانی دووڕووەکان و ئاکامیان**

خودای مەزن دەفەرموێت: ﴿ إِنَّ ٱلَّذِينَ ءَامَنُوا۟ ثُمَّ كَفَرُوا۟ ثُمَّ ءَامَنُوا۟ ثُمَّ كَفَرُوا۟ ثُمَّ ٱزْدَادُوا۟ ﴾ ئەوکەسانەی یەکەمجا بڕوایان هێناوپاشان پەشیمان بوونەوەو دووبارە بڕوایان هێناو بە شوێنیدا پەشیمان بوونەوەن پاشان خودانەناسیان زیاتربوو. خودای مەزن باسی ئەوکەسانە دەکات کە هاتوونەتە ناو ئیسلامو بڕوایان هێناوەو پاشان پەشیمان بوونەتەوەو دیسان هاتوونەتەوە، دواجاریش پەشیمان بوونەتەوەو لەسەر گومڕایی خۆیان هەر بەردەوام ماونەتەوە، بەڵکو خراپتریش بوون هەتا مردن، بێگومان دوای مردن پەشیمان بوونەوە نیە، خودا لێیان خۆش نابێت. خودا ڕێنمایی و دەرو لەوکەسانە ناکاتەوەو شارەزای ڕستەڕێشیان ناکات. بۆیە دەفەرموێت: ﴿لَّمْ يَكُنِ ٱللَّهُ لِيَغْفِرَ لَهُمْ وَلَا لِيَهْدِيَهُمْ سَبِيلًۢا ﴾ هەرگیز خودا نایان بەخشێتو ڕێگایەکیان نیشان نادات. ئیبنو ئەبی حاتەم ڕیوایەتی کردووە لە ئیبنو عەبباسەوە لەمەدا خودای گەورە دەفەرموێت: ﴿ثُمَّ ٱزْدَادُوا۟ كُفْرًا ﴾ وتی: بەردەوام بوون لەسەر خودانەناسی هەتا مردن. موجاهیدش هەروا وتووە.[1] پاشان فەرموویەتی: ﴿ بَشِّرِ ٱلْمُنَٰفِقِينَ بِأَنَّ لَهُمْ عَذَابًا أَلِيمًا ﴾ مزگێنی بدە بە دووڕووەکان کە ئازارێکی زۆر بەژان وا لەڕێیانە. واتە: ئەو دووڕووانەی ئەمە پیشەیانە، باوەڕدێنن و پەشیمان دەبنەوە، مۆر دراوە بەسەر دڵیاندا. ﴿ ٱلَّذِينَ يَتَّخِذُونَ ٱلْكَٰفِرِينَ أَوْلِيَآءَ مِن دُونِ ٱلْمُؤْمِنِينَ ﴾ ئەوانەی دۆستی خودانەناسانن و لە کۆمەڵی باوەڕداران دەتەکنەوە. پاشان خودای گەورە وەسفی بەوە کردوون کە خودانەناسان دەکەنە دۆستی خۆیانو

---

[1] الطبری(٩/٣١٥).

پشت لە خاوەن باوەڕان دەكەن. بێگومان ئەوانە لەڕاستیدا لەگەڵ خودانەناسانن لە دڵەوە ئەوانیان خۆشدەوێتو دڵیان لەگەڵ ئەوانە، كاتێك كە دەچنە ناو خودانەناسان پێیان دەڵێن: ئێمە لەگەڵ ئێوەین، ئێمە گاڵتە بەوان دەكەینو پێیان ڕادەبوێرین، كە دەڵێین لەگەڵ ئێوەینز خودای گەورەش بێزاری خۆی دەربارەی ئەو دووڕووانە دەردەبڕێت لەسەر ئەو دۆستایەتی كردنەیان لەگەڵ خودانەناساندا دەفەرمووێت: ﴿أَيَبۡتَغُونَ عِندَهُمُ ٱلۡعِزَّةَ فَإِنَّ ٱلۡعِزَّةَ لِلَّهِ جَمِيعٗا﴾ ئایا بەهیوای ئەوەن كە لەلای ئەوان ڕێزو حورمەتیان دەست بكەوێت؟ بابزانن ڕێزو قەدر هەر لەلای خودا هەیە. كە شەریكی نیە، هەركەسێكیش خودا خۆی مەیلی لێ بێت قەدرو ڕێزی بۆ پەیدادەكات. وەك لە ئایەتێكی تردا فەرموویەتی: ﴿ مَن كَانَ يُرِيدُ ٱلۡعِزَّةَ فَلِلَّهِ ٱلۡعِزَّةُ جَمِيعًا﴾[1] هەركەسێك ڕێزو حورمەتی دەوێت، ڕێزو قەدر گشتی لەدەست خودایە، وە فەرموویەتی: ﴿وَلِلَّهِ ٱلۡعِزَّةُ وَلِرَسُولِهِۦ وَلِلۡمُؤۡمِنِينَ وَلَٰكِنَّ ٱلۡمُنَٰفِقِينَ لَا يَعۡلَمُونَ﴾[2] هەرچی قەدرو ڕێز هەیە بۆ خوداو پێغەمبەرەكەی و خاوەن باوەڕانە. بەڵام دووڕووەكان نازانن. مەبەست لەم هاندانەدا بۆ داواكردنی ڕێزو حورمەت لە خودا پێشبڕكێ كردنە لەسەر خودانەناسو خۆخستنە ناو ڕێزی بەندە خاوەن باوەڕەكانیەوە كە سەركەوتن هەر بۆ ئەوانە لە دونیاو لە قیامەتدا. وە دەفەرمووێت: ﴿وَقَدۡ نَزَّلَ عَلَيۡكُمۡ فِي ٱلۡكِتَٰبِ أَنۡ إِذَا سَمِعۡتُمۡ ءَايَٰتِ ٱللَّهِ يُكۡفَرُ بِهَا وَيُسۡتَهۡزَأُ بِهَا فَلَا تَقۡعُدُواْ مَعَهُمۡ حَتَّىٰ يَخُوضُواْ فِي حَدِيثٍ غَيۡرِهِۦٓۚ إِنَّكُمۡ إِذٗا مِّثۡلُهُمۡ﴾ لەم قورئانەدا بە ئێوەی ڕاگەیاندووە، هەركاتێك پێتانزانی كەسانێك هەن، لە وەختی قورئان خوێندندا دەست دەكەن بە گاڵتەوگەپو بە درۆی هەڵبەستەی دەزانن، ئێوە نابێت(هەتا ئەو باسە نەگۆڕن) لەگەڵیاندا دابنیشنن دەنا ئێوەش ئەوسا وەك ئەوان دەبن. واتە: ئەگەر ئێوە ئەوكارە خراپانەی ئەوانتان كردو ڕازی بوون لەگەڵ ئەوانە دابنیشن كە باوەڕ بە نیشانەكانی خودا ناكەنو گاڵتەی پێ دەكەنو بە كەم سەیری دەكەنو تێكەڵاویتان كردنو ڕازی بوون بەوەی كە خەریكن ﴿إِنَّكُمۡ إِذٗا مِّثۡلُهُمۡ﴾ ئێوەش ئەوسا وەك ئەوان گوناهبارن. پاشان خودای مەزن دەفەرمووێت: ﴿إِنَّ ٱللَّهَ جَامِعُ ٱلۡمُنَٰفِقِينَ وَٱلۡكَٰفِرِينَ فِي جَهَنَّمَ جَمِيعًا ﴾ دیارە خوداش لەگەڵ هەموو ئەوكەسانەی دووڕوون لەگەڵ كۆمەڵی خودانەناسان لە جەهەننەم كۆدەكاتەوە. واتە: وەك چۆن دووڕووەكان هاوبەشیان كردن لە خودانەناسیدا بەوشێوەیەش خودا دەیانكاتە هاوبەش لەناو ئاگری جەهەننەمدا كۆیان دەكاتەوە، كە شوێنی سزادانو ڕیسواكردنە، بە

---

[1] فاطر(١٠).

[2] المنافقون(٨).

کۆت و زنجیرکراوی و ئاوەکۆو کێم و زوخی جەهەننەمیەکان دەرخواد دەدرێن لە باتی ئاوی سارد و سازگاردا.

﴿ٱلَّذِينَ يَتَرَبَّصُونَ بِكُمْ فَإِن كَانَ لَكُمْ فَتْحٌ مِّنَ ٱللَّهِ قَالُوٓا۟ أَلَمْ نَكُن مَّعَكُمْ وَإِن كَانَ لِلْكَٰفِرِينَ نَصِيبٌ قَالُوٓا۟ أَلَمْ نَسْتَحْوِذْ عَلَيْكُمْ وَنَمْنَعْكُم مِّنَ ٱلْمُؤْمِنِينَ ۚ فَٱللَّهُ يَحْكُمُ بَيْنَكُمْ يَوْمَ ٱلْقِيَٰمَةِ ۗ وَلَن يَجْعَلَ ٱللَّهُ لِلْكَٰفِرِينَ عَلَى ٱلْمُؤْمِنِينَ سَبِيلًا ﴿١٤١﴾﴾

**دووڕووەکان چاوەڕوانی موسڵمانەکان دەکەن تا بزانن سەردەکەون یان لەناودەچن**

خودای مەزن دەفەرمووێت: ﴿ٱلَّذِينَ يَتَرَبَّصُونَ بِكُمْ﴾ ئەوانە چاوەڕوانی دەرفەتێك بوون بۆتان. خودای گەورە باسی دووڕووەکان دەکات کە چاوەڕوانی دەرفەتێك بوون کە تووشی شکست بێن. واتە: بەهیوای ئەوەبوون کە دەوڵەتەکەیان نەمێنێت و لەناوبچێت و خودانەناسان سەربکەون بەسەریانداو ئاینەکەیان لەناوبەرن. ﴿فَإِن كَانَ لَكُمْ فَتْحٌ مِّنَ ٱللَّهِ﴾ هەرکاتێك خودا ئێوەی سەرخست و یارمەتی دان و دەستکەوتی دەستخستن. ﴿قَالُوٓا۟ أَلَمْ نَكُن مَّعَكُمْ﴾ دەڵێن: ئێمەش هەر لەگەڵ ئێوەدا نەبووین؟ دەیانەوێت بەم قسەیە دڵی موسڵمانان بۆلای خۆیان ڕابکێشن. ﴿وَإِن كَانَ لِلْكَٰفِرِينَ نَصِيبٌ﴾ خۆئەگەر خودانەناسانیش لە بەشێکدا سەرکەوتنێکیان بەدەست بهێنایەن وەك لە ڕۆژی ئوحود دا ڕویدا بێگومان پێغەمبەران تووشی تاقیکردنەوە دێن بەڵام پاشەڕۆژ هەر بۆ ئەوانە ﴿قَالُوٓا۟ أَلَمْ نَسْتَحْوِذْ عَلَيْكُمْ وَنَمْنَعْكُم مِّنَ ٱلْمُؤْمِنِينَ﴾ پێیان دەڵێن: ئایا ئێمە زاڵمان نەکردن بەسەر ئەواندا و ئێوەمان نەپاراست لە بڕواداران؟ واتە: هونەرو ئازایەتی ئێمە بوو، ئێمە بەدڵ لەگەڵ ئێوە بووین بۆیە سەرکەوتن بەسەریاندا. سوددی وتی: ﴿نَسْتَحْوِذْ عَلَيْكُمْ﴾ ئێمە سەرکەوتنمان بەدەست هێناوە بۆ ئێوە.[1] وەك ئەم ئایەتە کە خودای گەورە دەفەرمووێت: ﴿ٱسْتَحْوَذَ عَلَيْهِمُ ٱلشَّيْطَٰنُ﴾[2] شەیتان بەسەریاندا زاڵ بووە. ئەمەش دەربڕینی خۆشەویستیە بۆ خودانەناسان لەلایەن دووڕووەکانەوە، ئەوکارەیان بۆیە دەکرد هەتا لەلای ئەمان و ئەوانیش شتێك وەربگرن و دڵنیابن و ترسیا لە هیچ لایەکیان نەبێت، ئەمەش بەهۆی لاوازی بڕوا و بەدگومانیەوە بووە، خودای مەزنیش دەفەرمووێت: ﴿فَٱللَّهُ يَحْكُمُ بَيْنَكُمْ يَوْمَ ٱلْقِيَٰمَةِ﴾ خودا لە ڕۆژی قیامەتدا بڕیاری یەکجاری دەدات لە نێوانیاندا. واتە: خودا ئاگای لێتانە ئەی دووڕووەکان، دەزانێت

---

[1] المجادلة(١٩).

[2] الطبري(٩/٣٢٥).

چیتان لێ شاردووەتەوە، لەخۆبایی مەبن بە جێبەجێکردنی حوکمی شەرعی بەسەرتاندا بە زاهیری لە ژیانی دونیادا، بێگومان ئەوەی دەربارەتان دەکرێت بەجێیەو پڕە لە کارزانی. لە ڕۆژی قیامەتدا ئەو ڕووکەشیەتان هیچ سوێکتان پێ ناگەیەنێت، بەڵکو ڕۆژێکە هەموو نهێنیو شاراوەکان دەخرێتەڕوو ﴿وَلَن يَجْعَلَ اللَّهُ لِلْكَافِرِينَ عَلَى الْمُؤْمِنِينَ سَبِيلًا وَلَن يَجْعَلَ اللَّهُ لِلْكَافِرِينَ عَلَى الْمُؤْمِنِينَ سَبِيلًا﴾ خودا هرگیز هیچ ڕێگایەك نادات بە خوداناسان کە دژی خاوەن باوەڕان بێت. ئەبو ڕەزاق ڕیوایەتی کردووە لە یوسەیعی کیندیەوە(يُسيع الكيندى) وتی: پیاوێك هات بۆلای عەلی کوڕی ئەبوتالب وتی: ئەم ئایەتە چۆنە؟ ﴿وَلَن يَجْعَلَ اللَّهُ لِلْكَافِرِينَ عَلَى الْمُؤْمِنِينَ سَبِيلًا﴾ عەلی(ڕەزای خودای لێ بێت) وتی: نزیکی کەونەوە، نزیکی کەونەوە.پاشان وتی: ﴿فَاللَّهُ يَحْكُمُ بَيْنَكُمْ يَوْمَ الْقِيَامَةِ وَلَن يَجْعَلَ اللَّهُ لِلْكَافِرِينَ عَلَى الْمُؤْمِنِينَ سَبِيلًا﴾[1] ئیبنو جورەیجیش هەرا ڕیوایەتی کردووە لە عەتای خۆراسانیەوە لە ئیبنو عەبباسەوە: ﴿وَلَن يَجْعَلَ اللَّهُ لِلْكَافِرِينَ عَلَى الْمُؤْمِنِينَ سَبِيلًا﴾ وتی: ئەوە لە ڕۆژی قیامەتدایەز[2] هەر بەم شێوەیە سوودی ڕیوایەتی کردووە لە ئەبومالیکی ئەشجەعیەوە، کە ڕۆژی قیامەتە[3] سوودی وتی: ﴿سَبِيلًا﴾ واتە: بەڵگەیەك[4] هەڵیشدەگرێت ئەم ئایەتە: ﴿وَلَن يَجْعَلَ اللَّهُ لِلْكَافِرِينَ عَلَى الْمُؤْمِنِينَ سَبِيلًا﴾ ماناکەی ئەوەبێت، لە دونیادا خودا بڕواداران سەردەخات بەسەر خودانەناساندا و بەتەواوی لەبنیان دەنێت، با هەندێك سەرکەوتنیش بەدەست بێنن بەسەر خەڵکدا لە هەندێك کاتدا، بێگومان پاشەڕۆژ هەر بۆ لە خوداترسانە لە دونیاو لە قیامەتدا. وەك خودای گەورە دەفەرموێت: ﴿إِنَّا لَنَنصُرُ رُسُلَنَا وَالَّذِينَ آمَنُوا فِي الْحَيَاةِ الدُّنْيَا﴾[5] بێگومان ئێمە پێغەمبەرانمانو ئەوکەسانەی کە باوەڕیان هێناوە لە ژیانی ئەم دونیایەدا سەردەخەین. ئەم ئایەتە وەڵامە بۆ ئەو د ووڕووانەی کە بەو هیوایە چاوەڕوانی ئەوەیان دەکرد کە موسڵمانەکان شکست بێننو دەستەڵاتیان نەمێنێتو دەوڵەتەکەیان بڕوخێت. هەوڵی ئەوەشیان دەدا کە دڵی خودانەناسان ڕاگرن تا ترس لەخۆیان دووربخەنەوە ئەگەر سەرکەوتن بەسەر خاوەن باوەڕاندا و لەناویان بەردن. وەك خودای گەورە دەفەرموێت: ﴿فَتَرَى الَّذِينَ فِي قُلُوبِهِم مَّرَضٌ

---

[1] عبدالرزاق(١/١٧٥).

[2] الطبرى(٩/٣٢٨).

[3] الطبرى(٩/٣٢٨).

[4] الطبرى(٩/٣٢٨).

[5] غافر(٥١).

يُسَٰرِعُونَ فِيهِمۡ يَقُولُونَ نَخۡشَىٰٓ أَن تُصِيبَنَا دَآئِرَةٞۚ فَعَسَى ٱللَّهُ أَن يَأۡتِيَ بِٱلۡفَتۡحِ أَوۡ أَمۡرٖ مِّنۡ عِندِهِۦ فَيُصۡبِحُواْ عَلَىٰ مَآ أَسَرُّواْ فِيٓ أَنفُسِهِمۡ نَٰدِمِينَ ﴾[1] ئەوكەسانەی نەخۆشی لە دڵیاندایە، دەبینی بەپەلەن بۆ چوونەلایان، دەڵێن: ئێمە دەترسین تووشی بەڵابین(بۆیە دۆستایەتیتان دەکەین) هیچ دوور نیە خودا ڕۆژێك سەریان بخات، یاخۆ کارێکی تر بکات. ئەوسا ئەوان لەو ڕازەی لە دڵیاندایە، تووشی پەشیمانی دەبن.

﴿إِنَّ ٱلۡمُنَٰفِقِينَ يُخَٰدِعُونَ ٱللَّهَ وَهُوَ خَٰدِعُهُمۡ وَإِذَا قَامُوٓاْ إِلَى ٱلصَّلَوٰةِ قَامُواْ كُسَالَىٰ يُرَآءُونَ ٱلنَّاسَ وَلَا يَذۡكُرُونَ ٱللَّهَ إِلَّا قَلِيلٗا ﴿١٤٢﴾ مُّذَبۡذَبِينَ بَيۡنَ ذَٰلِكَ لَآ إِلَىٰ هَٰٓؤُلَآءِ وَلَآ إِلَىٰ هَٰٓؤُلَآءِۚ وَمَن يُضۡلِلِ ٱللَّهُ فَلَن تَجِدَ لَهُۥ سَبِيلٗا ﴿١٤٣﴾﴾

**دووڕووەکان دەیانەوێت خودا بخەڵەتێنن، کە چی خودا دەیانخەڵەتێنێت، هەرکاتێك هەڵدەستن بۆ نوێژ بە تەمبەڵی و سستی هەڵدەستن، ڕووپامایی دەکەن لە نێوان بڕواداران و خودانەناساندا**

لە پێشەوە لە سەرەتای سورەتی(البقرة) دا خودای گەورە لەم ئایەتەدا فەرموویەتی: ﴿يُخَٰدِعُونَ ٱللَّهَ وَٱلَّذِينَ ءَامَنُواْ﴾ ئەوان خوداو خاوەن باوەڕان فریودەدەن. وە لێرەشدا دەفەرموێت: ﴿إِنَّ ٱلۡمُنَٰفِقِينَ يُخَٰدِعُونَ ٱللَّهَ وَهُوَ خَٰدِعُهُمۡ﴾ بەڕاستی دووڕووەکان دەیانەوێت خودا بخەڵەتێنن، کەچی خودا دەیانخەڵەتێنێت. بێگومان خودا فریونادرێت، چونکە خودا ئاگای لە گشت نهێنیەکانەو ئاگای لە ڕازی دڵەکانیشە. بەڵام دووڕووەکان لەبەر نەزانی و کەمی زانیاری و ئاوەزیانەوە، وا تێ دەگەن کە ئەو هەڵسوکەوتە لەلای خەڵکی لەبەردەڕواتو بەپێی بڕیاری شەرعیش مامەڵەیان لەگەڵ دەکرێت(وەك دەڵێن شەرع زاهیربینە) هەر بەو شێوەیەش بۆیان دەچێتەسەر لە ڕۆژی قیامەتدا لەلای خودا. وەك خودای گەورە باسی کردوون، کە ئەوانە سوێند دەخۆن بۆی دەڵێن لەسەر ڕاستەڕێ بوون و لایان نەداوەو وادەزانن ئەو سوێندخواردنە سودی هەیە بۆیان لەلای خودا وەك خودای گەورە دەفەرموێت: ﴿يَوۡمَ يَبۡعَثُهُمُ ٱللَّهُ جَمِيعٗا فَيَحۡلِفُونَ لَهُۥ كَمَا يَحۡلِفُونَ لَكُمۡ﴾[2] ڕۆژێك خودا هەموویان زیندوودەکاتەوە، دیسان سوێند بۆ ئەو(خودا) دەخۆن وەك بۆ ئێوە سوێند دەخۆن. خودای مەزن دەفەرموێت: ﴿وَهُوَ خَٰدِعُهُمۡ﴾ کەچی خودا دەیانخەڵتێنێت. واتە: کەم کەم بۆیان شل دەکاتو مۆڵەتیان دەدات لە سەرکەشی و گومڕایی خۆیاندابەردەوام بن و لە هەق دووریان دەخاتەوە هەتا لە دونیا پێی نەگەن و لە

[1] المائدة(٥٢).

[2] المجادلة(١٨).

ڕۆژی قیامەتیشدا هـەر پێـی نەگـەن. وەك خـودای گـەورە دەفـەرموێت: ﴿يَوْمَ يَقُولُ ٱلْمُنَٰفِقُونَ وَٱلْمُنَٰفِقَٰتُ لِلَّذِينَ ءَامَنُوا۟ ٱنظُرُونَا نَقْتَبِسْ مِن نُّورِكُمْ قِيلَ ٱرْجِعُوا۟ وَرَآءَكُمْ فَٱلْتَمِسُوا۟ نُورًا فَضُرِبَ بَيْنَهُم بِسُورٍ لَّهُۥ بَابٌۢ بَاطِنُهُۥ فِيهِ ٱلرَّحْمَةُ وَظَٰهِرُهُۥ مِن قِبَلِهِ ٱلْعَذَابُ ﴿١٣﴾ يُنَادُونَهُمْ أَلَمْ نَكُن مَّعَكُمْ قَالُوا۟ بَلَىٰ وَلَٰكِنَّكُمْ فَتَنتُمْ أَنفُسَكُمْ وَتَرَبَّصْتُمْ وَٱرْتَبْتُمْ وَغَرَّتْكُمُ ٱلْأَمَانِىُّ حَتَّىٰ جَآءَ أَمْرُ ٱللَّهِ وَغَرَّكُم بِٱللَّهِ ٱلْغَرُورُ ﴿١٤﴾ فَٱلْيَوْمَ لَا يُؤْخَذُ مِنكُمْ فِدْيَةٌ وَلَا مِنَ ٱلَّذِينَ كَفَرُوا۟ مَأْوَىٰكُمُ ٱلنَّارُ هِىَ مَوْلَىٰكُمْ وَبِئْسَ ٱلْمَصِيرُ﴾[1] ڕۆژێك دێت دووڕووەكانی پیاوو ژن بە خـاوەن بـاوەڕان دەڵـێن: بەرەودوای خۆتان وەرگەڕێن، لـەوێ ڕووناكی پەیدابكـەن ئـیتر ئەوسا دیوارێكیـان(شـوورەیەكیان) لـە نێوان دەبێتە لەمپەر، دەرگای هەیە لە ژوورەوە بەزەییەو لە دەرەوەی جەزرەبەیە. بانگیـان دەكـەن، ئایا ئێمەش هەر لەگەڵ ئێوە نەبووین؟ دەڵێن: بەڵێ، بـەڵام ئێـوە خۆتـان تووشـی بـەڵاكردو چاوەڕوان بوون‌و هەر دوودڵ بوون‌و بە ئارەزوو فریوتان خـوارد، هـەتا فـەرمانی خـودا هـات، شـەیتان ئێـوەی بـە خـودا بـایی هـەوا كـرد. ئـیتر ئـەمڕۆ نـە لـە ئێـوەو نـە لەوانـەی خودانـەناس بـوون، سـەرانەتنان لـێ وەرناگیرێت، جێتان ئـاگرەو هـەر ئەوێشتان پـێ ڕەوایەو چارەنوستان زۆر خراپـە. لـەم فـەرموودەدا هاتووە:(كەسێك بـۆ ناوبـانگ بیستنەوە كاربكـات خـودا نـاوی دەزڕێنێـت، كەسێكیش بـۆ بەرچـاوێنی كاربكات، خودا لەپێش چاوی خـەڵكی ئـابڕووی دەبـات)[2] خـودای مـەزن دەفـەرموێت: ﴿وَإِذَا قَامُوٓا۟ إِلَى ٱلصَّلَوٰةِ قَامُوا۟ كُسَالَىٰ﴾ ئەگـەر بـچن نوێژبكـەن بـە تەمبـەڵی‌و تـەوەزەلی دەیكـەن. ئەمـە ڕەوشـتی دووڕووەكانە لە چاكترین‌و بەڕێزترین كردارەكانـدا كـە نوێژكردنـە كـە هەڵدەسـتن بـۆ نوێـژكردن زۆر بـە تەمبەڵی هەڵدەستن دەیكەن، چونكە ئەوانە بە نیازی پاكەوە نایكەن‌و هەر بڕوایان پێی نیە، بە تـرس‌و بیرو هۆشەوە هەڵناستن بۆ نوێژكردن. ئەمە هەڵس‌وكەوتی ئاشكرایانە. پاشان خودا دێتەسەر باسی ناو دڵیان كە چەند پیس‌و خراپەو دەفـەرموێت: ﴿يُرَآءُونَ ٱلنَّاسَ﴾ ڕووبینـی لـە خـەڵك دەكـەن. واتـە: بـە دڵسۆزی‌و لەبـەر خـودا كارەكانیـان ناكـەن، بـەڵكو لەبـەر چاوی خـەڵكی‌و بـۆ ڕووپـامـایی كاردەكـەن، هەربۆیە زۆر لەو نوێژانە ئامادەنابن كە خەڵكی چاوی لێیان نیە، وەك نوێژی عیشاو بەیانی كە تاریكـەو خـەڵك بەباشـی نابینرێـت. وەك لـە هـەردوو سـەحیحەكەدا هـاتووە كـە پێغەمبـەری خـودا(ﷺ) فەرموویـەتی:(گـرانترین نوێـژ لەسـەر دووڕووەكـان نوێـژی بـەیانیان‌و خەوتنانـە، ئەگـەر بیانزانیایـە چ پاداشتێكیان تێدایە، ئەگەر بە كاگۆڵكێش بووایە دەهاتن، نیازم وابوو كە فەرمان بكەم قامەت بكەن بۆ

---

[1] الحدید(١٣- ١٥).

[2] فتح الباری(١١/٣٤٣).

نوێژو فەرمان بکەم بە پیاوێك نوێژەکەیان بۆبکات، ئینج خۆم لەگەڵ چەند پیاوێك دەرچم(چەند باوەشێك داریان پێ بێت) بۆسەر ئەوانەی نایەن بۆ نوێژ، خانووەکانیان بەسەردا بسوتێنم)[1] لە ڕیوایەتێکی تردا هاتووە:(سوێند بەوکەسەی گیانی منی بەدەستە ئەگەر یەکێکیان بیانزانیایە ئێسقان یان سمی(قاچ) گۆشتینی دەست دەکەوێت دەهات بۆ نوێژەکە، خۆ ئەگەر لەو ماڵانەدا ژن و منداڵ نەبووایە ماڵەکانیانم بە ئاگر دەسوتاند بەسەریاندا)[2] ﴿وَلَا يَذْكُرُونَ اللَّهَ إِلَّا قَلِيلًا﴾ کەمێك نەبێت یادی خودا ناکەن. بە دڵو گەردنکەچیەوە نوێژ ناکەن و ئاگایان لێ نیە چی دەڵێن.بەڵکو ئەوانە لە نوێژەکەیاندا ساردسڕن و تەمبەڵی دەکەن، ئەوەی خێری تێدابێت بۆیان پشتی تێ دەکەن، مالیك ڕیوایەتی کردووە لە عەلائی کوڕی عەبدوڕەحمانەوە لە ئەنەسی کوڕی مالیکەوە وتی: پێغەمبەری خودا(ﷺ) فەرموویەتی:(ئەوە نوێژی دووڕووەکانە، ئەوە نوێژی دووڕووەکانە، ئەوە نوێژی دووڕووەکانە، دادەنیشێت و چاودێری خۆر دەکات و هەتا کاتێك کە دەگاتە دوو شاخی شەیتان(مەبەست پێی کاتی خۆرئاواو خۆرهەڵاتنی بەیانیە) چوارجار دەنووك لە زەوی دەدەن، کەمێك نەبێت یادی خودا ناکەن)[3] هەروا موسلیم و تیرمیزی و نەسائی ڕیوایەتیان کردووە، تیرمیزی وتی: فەرموودەیەکی حەسەنی غەریبە.[4] خودای گەورە دەفەرموێت: ﴿مُّذَبْذَبِينَ بَيْنَ ذَٰلِكَ لَا إِلَىٰ هَٰؤُلَاءِ وَلَا إِلَىٰ هَٰؤُلَاءِ﴾ دوودڵ و دڵەڕاوکێیانە لەو نێوانەدا بچنە لای ئەمان، یان خۆیان بدەنە لای ئەوان. واتە: دووڕووەکان سەرگەردانن لە نێوان خودانەناسی و بڕواهێناندا. نە لەگەڵ خاوەن باوەڕانن بە ئاشکراو بە نهێنی نە لەگەڵ خودانەناسانیشن بە ئاشکراو بە نهێنی. بەڵکو بە ئاشکرا لەگەڵ موسڵماناندان و بە نهێنیش لەگەڵ خودانەناسان. هەندێکیشیان دوودڵن، جارێك بەلای موسڵماناندا دەچن و جارێك بەلای خودانەناساندا دەچن. ﴿كُلَّمَا أَضَاءَ لَهُم مَّشَوْا فِيهِ وَإِذَا أَظْلَمَ عَلَيْهِمْ قَامُوا﴾[5] هەرکاتێك ڕووناکی بۆ بدانایەتەوە دەکەوتنەڕێ، هەرکاتێکیش تاریکی بکردایە لێیان ڕادەوەستان، موجاهید وتی: ﴿مُّذَبْذَبِينَ بَيْنَ ذَٰلِكَ لَا إِلَىٰ هَٰؤُلَاءِ﴾ واتە: هاوەڵەکانی محمد(ﷺ). ﴿وَلَا إِلَىٰ هَٰؤُلَاءِ﴾ واتە: جوولەکەکان. ئیبنو جەریر ڕیوایەتی کردووە لە ئیبنو عومەرەوە لە پێغەمبەری خودا(ﷺ) کە فەرموویەتی:(وێنەی دووڕوو وەك وێنەی مەڕی وێڵی نێوان دوو ڕانە مەڕ وەهایە، جارێك هاو گەلەی ئەم لادەبێت و جارێك هاو گەلەی

---

[1] فتح الباری(٢/٥٣).، مسلم(١/٤٥١).

[2] فتح الباری(٢/٢٤٨).، مسلم(١/٣٢٥).

[3] الموطأ(١/٢٢٠) فەرموودەیەکی سەحیحە.

[4] مسلم(١/٤٣٤)، تحفة الاحوذي(١/٤٩٧)، النسائي(١/٢٥٤).

[5] البقرة(٢٠).

ئەولا، نازانێت بەشوێن چ لایەکیاندا بڕوات)[1] موسلیمیش خۆی بەتەنها هێناویەتی[2] هەر بۆیە خودای مەزن دەفەرموێت: ﴿وَمَن يُضْلِلِ ٱللَّهُ فَلَن تَجِدَ لَهُۥ سَبِيلًا﴾ کەسێك خودا ڕێی لێ بگۆڕێت، تۆ ناتوانیت هیچ ڕێگەیەکی نیشان دەیت. واتە: هەر کەسێك خودا لەڕێی ڕاست لای بدات تۆ ناتوانیت دۆستو ڕێ نیشاندەری بۆ پەیدا بکەیت. چونکە هەرکەسێك خودا گومڕای کرد کەس ناتوانێت ڕێگەی نیشان بدات. ئەو دووڕووانەی کە خودا لایداون لەسەر ڕێگەی ڕاست کەس ناتوانێت ڕزگاریان بکاتو بینخاتە سەر ڕێگا. بێگومان کەس ناتوانێت بەر بەفەرمانی خودا بگرێت، پرسیاری لێ ناکرێت بۆ هەر کارێك دەیکات، بەڵکو ئەوان هەموو پرسیاریان لێ دەکرێت.

﴿يَٰٓأَيُّهَا ٱلَّذِينَ ءَامَنُواْ لَا تَتَّخِذُواْ ٱلْكَٰفِرِينَ أَوْلِيَآءَ مِن دُونِ ٱلْمُؤْمِنِينَ ۚ أَتُرِيدُونَ أَن تَجْعَلُواْ لِلَّهِ عَلَيْكُمْ سُلْطَٰنًا مُّبِينًا ﴿١٤٤﴾ إِنَّ ٱلْمُنَٰفِقِينَ فِى ٱلدَّرْكِ ٱلْأَسْفَلِ مِنَ ٱلنَّارِ وَلَن تَجِدَ لَهُمْ نَصِيرًا ﴿١٤٥﴾ إِلَّا ٱلَّذِينَ تَابُواْ وَأَصْلَحُواْ وَٱعْتَصَمُواْ بِٱللَّهِ وَأَخْلَصُواْ دِينَهُمْ لِلَّهِ فَأُوْلَٰٓئِكَ مَعَ ٱلْمُؤْمِنِينَ ۖ وَسَوْفَ يُؤْتِ ٱللَّهُ ٱلْمُؤْمِنِينَ أَجْرًا عَظِيمًا ﴿١٤٦﴾ مَّا يَفْعَلُ ٱللَّهُ بِعَذَابِكُمْ إِن شَكَرْتُمْ وَءَامَنتُمْ ۚ وَكَانَ ٱللَّهُ شَاكِرًا عَلِيمًا ﴿١٤٧﴾﴾

**قەدەغەکردنی دۆستایەتی لەگەڵ خودانەناساندا**

خودای مەزن دەفەرموێت: ﴿يَٰٓأَيُّهَا ٱلَّذِينَ ءَامَنُواْ لَا تَتَّخِذُواْ ٱلْكَٰفِرِينَ أَوْلِيَآءَ مِن دُونِ ٱلْمُؤْمِنِينَ﴾ ئەی کۆمەڵی خاوەن باوەڕان خودانەناسان مەکەنە دۆستی خۆتان لەبەر بڕواداران. خودای گەورە قەدەغەی کردووە کە موسوڵمانان خودانەناسان بکەنە دۆستی خۆیان لەجێی خاوەن باوەڕان. واتە: نابێت لەگەڵیان هەڵسنو دانیشنو هاوکاریو دۆستایەتیان بکەنو بەنهێنی ڕێزو خۆشەویستی خۆتانیان بۆ دەربڕنو لەو شتە نهێنیانەی ناو موسوڵمان ئاگاداریان بکەن. وەك خودای مەزن لە ئایەتێکی تردا دەفەرموێت: ﴿لَّا يَتَّخِذِ ٱلْمُؤْمِنُونَ ٱلْكَٰفِرِينَ أَوْلِيَآءَ مِن دُونِ ٱلْمُؤْمِنِينَ ۖ وَمَن يَفْعَلْ ذَٰلِكَ فَلَيْسَ مِنَ ٱللَّهِ فِى شَىْءٍ إِلَّآ أَن تَتَّقُواْ مِنْهُمْ تُقَىٰةً ۗ وَيُحَذِّرُكُمُ ٱللَّهُ نَفْسَهُۥ﴾[3] باوەڕداران، بێجگە لە باوەڕداران نەکرن بەدۆست، هەر کەسێك لەم فەرمانە دەربچێت هیچ بەشی بەخوداوە نیە، جا مەگین لێیان بترسنو لەناچاری پێیان بڵێین: دۆستی ئێوەین. خودا دەیەوێت هەر بەڕاستی لەو بترسن. واتە: دەتان ترسێنێت لە تۆڵەو سزای خۆی، ئەگەر سنورەکانی ئەوتان بەزاند. هەر بۆیە لێرەدا دەفەرموێت:

---

[1] الطبری(٩/٣٣٣).

[2] مسلم(٤/٢١٤٦).

[3] ال عمران(٤/٢١٤٦).

﴿أَتُرِيدُونَ أَن تَجْعَلُوا لِلَّهِ عَلَيْكُمْ سُلْطَٰنًا مُّبِينًا﴾ ئایا ئێوە دەتانەوێت بەلگەیەکی بەئاشکرای خۆتان بدەن بەخودا؟ واتە: بەلگەیەکی دژ بەخۆتان بەخودا بدەن تا سزاتان بدات. ئیبنو ئەبی حاتەم ڕیوایەتی کردووە لە ئیبنو عەبباسەوە لەم دەقەدا ﴿سُلْطَٰنًا مُّبِينًا﴾ گشت سەلماندنێك لەناو قورئاندا بەلگەیە. موجاهدو عیکرمەو سەعیدی کوڕی جوبەیرو موحەممەدی کوڕی کەعبی قەرەزیو زەحاكو سوددیو نەزری کوڕی عەرەبیش(النظر بن عربی) هەر وایان وتووە.

**(دووڕووەکان) ئەوانەی دۆستایەتی خودانەناسان دەکەن لە پلەی هەرە خواری ناو ئاگردان مەگەر تەوبەبکەن**

پاشان خودای مەزن دەفەرموێت: ﴿إِنَّ الْمُنَافِقِينَ فِي الدَّرْكِ الْأَسْفَلِ مِنَ النَّارِ﴾ بێگومان ئەو کەسانەی دووڕوون وان لەقاتی(پلەی) هەرە بەرەو خواری ئاگردا. واتە: لە پاداشتی ئەو خودانەناسیە توندەیاندا وان لە نزمترین شوێنی ناو ئاگردا لە ڕۆژی قیامەتدا. والیبی، وتی: لە ئیبن عەبباسەوە لەم ئایەتەدا ﴿فِي الدَّرْكِ الْأَسْفَلِ مِنَ النَّارِ﴾ لەنزمترین شوێنی ناو ئاگردا[1] هەندێك وتویانە: ئاگریش قات قاتە وەك بەهەشت پلە پلەیە. ئیبنو جەریر ڕیوایەتی کردووە لە عەبدوللای کوڕی مەسعودەوە ﴿إِنَّ الْمُنَافِقِينَ فِي الدَّرْكِ الْأَسْفَلِ مِنَ النَّارِ﴾ وتی: لەچەند ژوورێکی لەئاگردا کە لەسەریان داخراوەو قفلدراوە[2] ئیبنو ئەبی حاتەم ڕیوایەتی کردووە لە ئیبنو مەسعودەوە وتی: دەیانخەنە ناو چەند ژوورێکەوە لە ئاگرو لەسەریان داخراوە لە بەرەو ژێر ترین شوێنی ئاگردا ﴿وَلَن تَجِدَ لَهُمْ نَصِيرًا﴾ تۆ ناتوانیت یارمەتی دەریان بۆ پەیدا بکەیت. کە ڕزگاریان بکاتو لەو سزا سەختو بەژانە دەریان بێنێت. پاشان خودای گەورە باسی ئەو دووڕووانە دەکات، دەفەرموێت: ﴿إِلَّا الَّذِينَ تَابُوا وَأَصْلَحُوا وَاعْتَصَمُوا بِاللَّهِ وَأَخْلَصُوا دِينَهُمْ لِلَّهِ فَأُولَٰئِكَ مَعَ الْمُؤْمِنِينَ﴾ مەگین ئەو کەسانەی دووڕوون، دەست لە دووڕوویی هەلدەگرنو تەواو پەشیمان ببنەوەو ڕێگەی چاکە بگرنە بەر خۆیان بەخودا بسپێرنو بە دلی پاك ببنە دینداری بەڕاستی. ئا ئەوانە لەگەل خاوەن باوەڕاندا دەبن. واتە: ئەو کەسانەی لەوانە تەوبەی تەواو دەکەن لە دونلداو بەدل دەست دەگرن بەئاینی خوداوەو کردارەکانیان چاك دەکەن، خودا تەوبەکەیان لێ قبول دەکات لەڕۆژی قیامەتدا لە ڕیزی خاوەن باوەڕاندا هەژماریان دەکات. ﴿وَسَوْفَ يُؤْتِ اللَّهُ الْمُؤْمِنِينَ أَجْرًا عَظِيمًا﴾ لەمەوبەدوا خودا پاداشتی زۆر گەورە بە خاوەن باوەڕان دەکات.

---

[1] الطبری(٩/٣٣٩).

[2] الطبری(٩/٣٣٩).

پاشان خودای مەزن باسی بێ نیازی خۆی دەکات لە بەندەکانی بەپێ تاوانەکانیشیان سزایان دەداتو دەفەرمووێت: ﴿مَّا يَفْعَلُ ٱللَّهُ بِعَذَابِكُمْ إِن شَكَرْتُمْ وَءَامَنتُمْ﴾ ئەگەر ئێوە بڕواتان بە خودا هەبێتو چاکەی ئەوتان لەبەرچاوبێتن خودا چکاری بە ئازادی ئێوە داوە؟ واتەك ئازارتان نادات ئەگەر چاكو بڕوادارین بە خوداو پێغەمبەرەکەی(ﷺ). ﴿وَكَانَ ٱللَّهُ شَاكِرًا عَلِيمًا﴾ خودا سوپاسی پێ زانان قبوڵ دەکاتو لە هەمووشت ئاگادارە. واتە: هەرکەسێك سوپاسو ستایشی خودا بکات، خوداش ڕێزی لێ دەگرێت، هەرکەسێکیش بە دڵ بڕوای پێی بێت ئاگای لێیەتیو لەسەر ئەوە پاداشتی زۆرباشی دەداتەوە.

# پێـرسـت